# دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

# ئاراس

**زنجیرەی رۆشنبیری**

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

***

**ناوی کتێب: فەرهەنگی کوردستان**

**ناوی دانەر: گیوی موکریانی**

**ژمارەی سپاردن لەکتێبخانەی نیشتمانی: ٢١٨**

**ساڵی ١٩٩٩**

**چاپی یەکەم**

# پێشەکی

**د. کوردستان موکریانی**

**هەولێر ١٩٩٩/٣/٢٥**

لە چاوپێکەوتنێکی من و د. جەمال و مینەواسی کورمان لەگەڵ ڕێزدار نێچیرڤان بارزانی و بە ئامادەبوونی کاک بەدران ئەحمەد سکرتێری ڕۆژنامە نووسی لە ١٩٩٨/٧/٢٩ لە هەولێردا پرۆژەی چاپکردنی ئەو فەرهەنگەی بەردەستتان هاتە پێش، کاتێ کە کاک نێچیرڤان بارزانی پێشنیازی لە چاپدانی دەستنووسەکانی گیوی موکریانی باوکمی کرد و منیش یەکسەر ئامادەیی خۆم پێشان داو لە ڕۆژی دواتر داواکارێکم لە سەر ئەو بابەتە پێشکێش کرد و جەنابی بڕیاری چاپکردنی دا.

بۆ بەدیهێنانی ئەم پرۆژەیە من لە ١٩٩٨/١١/١٨ دا لە هەولێر ئامادەبووم و لە ١٩٩٨/١١/٢٥ دا کاک بەدران ئەحمەد دڵسۆزانە شوێنی کارکردن بە هەموو کەل و پەلێکی پێویست، چوار کۆمپیوتەر، پرینتەر، سکەنەر، تەلەفۆن و.. بۆ ئامادەکردین. من، د. عەزیز گەردی و کاک ئەحمەد تاقانە سەرپەرشتی کارەکەمان بە دەستەوە گرت و کاک قاسم قادر پیرۆت بە نەخشەسازی و برایان لوقمان مووسا، حیکمەت عیساسلیمان، بەخشی مەلا ساڵح و سەفیرمەحموود تیپچن و برایان شێرزاد فەقێ ئیسماعیل و کەریم سۆفی و سەرپەرشتکارانیش وەک هەڵەچن کارمان تێداکرد، هەر ڕۆژەی لە هەشت ونیوی سەر لە بەیانی تا شەشی سەر لە ئێوارە وەک شانەی هەنگ مامەڵەمان لەگەڵ ووشەکانی ئەم فەرهەنگە بەنرخەدا دەکرد.

بەهەشتی گیوی موکریانی باوکم لەنێو زۆربەی چاپەمەنێکانی خۆیدا و هەروا لەو چاوپێکەوتنانەی، کە ڕۆژنامەنووسان لەگەڵیاندا کردووە، ئاواتی بە چاپ گەیاندنی فەرهەنگی کوردستانی خواستووە. ئەز لێرەدا تەنێ دوو لەو دەربڕینانەی دەخەمە ڕوو، کە یەکەمیان ئەو چاوپێکەوتنەیە، کە کاک عەبدولسەتار کازم لە گەڵیدا کردووە و ئەوەی دووەمیان خۆی لە فەرهەنگی مەهابادا باسی کردووە:

(..ولكني شخصياً منشغل باعادة استنساخ قاموسي المعنون: فەرهەنگی کوردستان / كردي ـ كردي وهو يزيد على خمسة الاف ورقة وقد استنسخت منه لحد الآن نصفه تقريباً حيث بلغت حرف الكاف وكل أملي أن أتم ذلك بأسرع وقت خشية أحداث الزمان... واظنك لا تدري بأنني قد اتممت تأليف قاموس آخر كردي ـ عربي وسميته ـ نۆبەرە ـ منذ أكثر من ثلاث سنوات ونصف، قدمته الى المجمع العلمي الكردي في حينه هدية مني، ولم أطلب سوى طبعه وقد وعدوني مراراً بذلك ولكن مع الاسف الشديد اعيد اليّ بعد كل تلك المدة، دون أن يطبع بحجة ان كتابته غير واضحة وانني الآن على اعتاب الآخرة، اعتب على المجمع ترى ان لم يقم هو بطبع مثل هذا الجهد وأنا على قيد الحياة لأتمتع بنشوة وجود اسمي عليه فقط دون أجر أو جزاء ترى متى يطبع أبعد مماتي؟ جريدة العراق ١٩٧٧/٤/١٨ ).

(فەرهەنگی کوردستان زۆر گەورەیە و پیتی زۆر ووردی گەرەکە، بە قاقەز و بەرگی و ئەرکی کارگەرانەوە نزیکەی (٢٠٠٠) دوو هەزار دینار پتری تێ دەچێ. لە ناو کۆڤاری هەتاوی هەتیو و جووانەمەرگیشدا زۆر جارانم هاوار کرد، کە دەستە جوامێرێکی دڵسۆز وەیا چەند دەوڵەمەندێکی کورد بێنە پێش فەرهەنگی کوردستانیان بە خۆڕایی بە هەموو مافێکیەوە پێشکەش دەکەم، داخەکەم کەس سەری هەڵنەدا. فەرهەنگی مەهاباد. هەولێر ٢٥٧٣ / ١٩٦١ لاپەڕە ١٤).

بەهەشتی گیو: ئەو جوامێرە دڵسۆزەی لە ساڵی (١٩٦١)ەوە چاوەڕێی بوویت، وا لە هەولێری پێتەختی کوردستانی ئازاددا سەری هەڵدا، بەڵێ ڕێزدار نێچیرڤان بارزانی ئەوەی بەهەشتی مەلا مستەفای بارزانی لە چاپدانی فەرهەنگی کوردستانی جوامێرانە وە ئەستۆ گرت. بەوبۆنەیەوە بە نێوی بنەماڵەکەمان سوپاس و پێزانینی بێ سنووری خۆمانی پێشکێش دەکەم و هیوادارم خودێی مەزن بۆ هەموو لایەکمانی بپارێزێت.

# تیشکێک لەسەر فەرهەنگی کوردستان

بەهەشتی گیوی موکریانی باوکم لە مێژووی فەرهەنگ نووسی کوردیدا بە باوکی فەرهەنگی کوردی دەژمێردرێت، چونکە پێنج فەرهەنگی بەنرخی پێشکێش بە نامەخانەی کوردی کردووە و تەمەنی گەنجی و پیری خۆی لەسەر داناوە. داماوی موکریانی مامم بیری فەرهەنگ دانانی خستۆتە مێشکی گیوی باوکمەوە، وەکو ئەرکێکی پێویست پێی سپاردووە، هەروەکو لە پێشەکی فەرهەنگی مەهابادا باوکم ڕۆڵی کاکی لە جۆری یارمەتیدان و ڕێ خۆشکردنی بۆچوونە نێو جیهانی فەرهەنگ نووسین ڕوون کردۆتەوە، هەروا هەوڵ و کۆششی بێ ووچانی خۆشی بەم جۆرەی ژێروو گێڕاوەتەوە:

((لە ناو هەموو هۆز و تیرە و شارێکی کوردستانی باکووردا هەموو مانگێکی یەکدوو کەسی شارەزای زمانی لەسەر ئەرکی خۆی (مەبەستی لە داماوی کاکێتی) لە دوورەوە بۆ دەهێنام وە لە دە تا بیست ڕۆژان لە ماڵی ئێمە دەمانەوە دووای ئەوەی کە سوودێکی پوختم لێوەردەگرتن لەسەر ئەرکی خۆمان بەڕێی دەکردنەوە شوێنی خۆیان هاوینانییش منی لەگەڵ چەند برادەرێکی بەناو دێهاتەکانی چیاکرمانج و دیاربەکر و ماردینیدا هەر بۆ ئەو مەبەستە دەگێڕا. لە (١٩٢٥)دا کە هاتینە ڕەواندز لەوێش بەشێنەیی زاراوەی سۆران و بارزانیانم لە سۆرانیان و هی ئەهریی و شکاک و عەبدۆییانییشم لە بەهەشتی سەید تەهاو دەست و پێوەندە مشەخت (مهاجر)ەکان وەردەگرت. ئیتر، کە کۆڤاری زاریی کرمانجی بەستراو گوزەرانمان زۆر تاڵ و دژوار تر بوو ناچار بۆ ئەوەی کە خانوو بەرەو گاو گۆیلکێکی، کە هەمان بوو بیانفرۆشم و پینە و پەڕۆی ژیانمانی پێ بکەم بە دزیی چوومەوە سابلاخی لەوێش عەجەم پەرستان ئاشکرایان کردم و گیرام و ڕەوانەی تەوریز کرام و ئیتر، کە بەڵێنی لە هەموو خزمەکانم وەرگیرا، کە جارێکی تر ڕوو لە عێراق نەکەمەوە و هەتاهەتایە بەندییواریم لەگەڵ کاکم نەمێنی ئازاد کرام ئیتر تا شەش سالانی تێدامامەوە بەلاّن ڕانەوەستام زاراوەی موکریانم بە هەموو هۆز و تیرە و دێهاتەکانەوە لەگەڵ هی شکاک و عەبدۆیی و جەلالی و لوڕ و کەلهوڕ و سنە (ئەردەلاّن) بە پێی توانا لەگەڵ هەڵبەست و بەسەرهات وویێنەی بوویژان کۆکردەوە و بۆ زاراوەی سوورچی و خۆشناو و زراریی و ئییدی ساڵێکی لە باتاس دانییشتم لە (١٩٢٩)دا کە بە ماڵەوە هاتمە هەولێر زاراوەی ئەو ناوچەیە وە بادینان و کۆیە و پژدەرێشم دەست کەوتن هەرلێرەوە دۆستایەتیشم لەگەڵ زۆر کەسی وەکوو شێخ نوری شێخ ساڵح و نوری سەعیدی سلێمانی و چەند کەسێکی کەرکوکی پەیدا کرد هەر چیەکی توانیبێتم لەوانم وەرگرتووە لە شاری کەرکوک چەند کەسێکی وەکو مامۆستا مەلاجەمیل ڕۆژبەیانی و مەلاخورشید و گەلێکی تر زاراوەی ناوچەی کەرکوکیان بۆ کۆکردوومەوە وە لە ١٩٤٠ تا (١٩٤٨)وە ٣ جاران چوومە سلێمانی و هەڵەبجە و هەورامان و زاراوەی سلێمانی و شارەزور و جاف و تاوگۆزی و هەورامان و ئییدیکەم ئەوەندەی کە لە توواناى سەلیقەم دابووبێ کۆم کردۆتەوە لە بەغداش لەنێو برا فەیلی و لوڕ و کەلهور و شواناندا زۆر کەسی وەکوو دوکتۆر جەعفەر و میرزا محمدی بوویژ و خوێندەوەرانی دیی یارمەتیان داوم لە هیچ سەردەمێکیدا کەم و زۆر کاتی خۆم بە خۆڕایی ڕانەبوواردوە لە نانێکی هەژاریی بەدەر بەندییواریم بەسەر هیچ جوورە خوواردن و خوواردنەوە و خۆشڕا بوواردن و هاموو شۆی سینەماو تەیاترۆ و باخ و باخچە و سەیران و سەیرانگایانەوە نەبووە، لەکاتی نەخۆشیشمدا هەر خەریک بووم لە هەینی و شەمە و یەکشەمەشدا وچانم نەداوە لە نیوانی (٥٠) ساڵاندا ڕۆژی جێژنانیش نەحەساومەوە. بۆ کەژمێرێک یا شەوێکی کە میبوانم هاتبا لە کاتێکدا کە لەوانە نەبن سوودیی فەرهەنگی ووێژەییبیان لێوەرگیریێ خۆم بە بەندیی و دیل زانیوە، بەندیخانەی هیچ دوژمنێکی نەیتوانیوە ڕستەی کاروبارم بپسێنی، لە ناو بەندیخانانداکە کوردی بە ناموسی زۆر تێدایە زاراوەکانیانم دەنووسینەوە لە کاتی پشکنیندا، کە ئاشکرا بووبایە دەیانکوت کوردی نوسین قەدەغەیە. دەمکوت لەبەر بێکاریی کاتی خۆم بەو جورە دەکوژم یا دەمکووت شێوەی زاراوەی ئەو برادەرەم زۆر پێ سەیرە بۆیە نووسییومەتەوە جارجارە لێیان دەدڕاندام وەیا دەیانسووتاند دووبارە دەمنووسینەوە بۆ ئەوەی لەو لایەنەوە درێژەی پێ نەدەم تەنها باسی گییرانی هەرە دووایی پارەکەی خۆم دەکەم کە چم کرد لە بەندییخانەی (حلەدا) چەند برادەرێکی فەیلی و لوڕیی تێدا بوون وەکوو کاک محەمەد سەعیدی فەیلی و ئیتر نزییکەی (١٥٠٠) ووشەم پتر کۆکردەوە ئەگەرچی دووای گەڕانەوەم بۆ هەولێر دەپازدەیەک نەبێ هەموویم هەبوو. مرۆڤێکی ئایینداری ڕاست چۆن شەووڕۆژ ناسرەوێ و بەلکوو تەنها لە خودا پەرستێتیدا ڕادەبوویرێ هەزاران سوپاس بۆ مامۆستای مەزنی موکریانی کە لەسەرەتای چاوکردنەوەمە وە تا دوواکۆچی خۆی لەوانە (دەرس)ی دابەشکردنی کوردستان و دوواکەوتنی کوردانی پتر پێ نەکوتووم. ئەوەندەشی تێ گەیاندم کە چارەی تەنها بە یەکێتی و هەوڵ و تەقەلایەکی بێ ووچان و گییان بازیەکی نەبەزانەوەیە ...) فەرهەنگی مەهاباد لاپەڕە ٥ ـ ٧)).

شێوەی ڕێزکردن و ڕێکخستنی ووشە فەرهەنگییەکان و جۆری لێکدانەوە و شرۆڤەکردن و یەکالاکردنیان بە ڕێگەیەکی ڕاست و دروستی زانستی فەرهەنگ دانان کراوە، لەم فەرهەنگەدا ئەو ووشانەی، کە پێویستییان بە لێکدانەوە بووە روونکراونەتەوە و بۆ زێتر ئاسانکردنی بە کار هێنانی ووشەکان بۆ هێندێک کار دەمکاتی کاری فەرمان، کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ و کاتەکانیشی ڕەچاوگیراون، لە زۆر شوێنی پێویستدا ڕستە بۆ ووشەکان هێندراوەتەوە و بە سەدان وێنەی کەل و پەل و گیانلەبەر و گژ و گیاو... دەوڵەمەند کراوە.

تایبەتێتی گرنگی دی ئەم فەرهەنگە لەوەشدا خۆی دەنوێنێت، کە ووشەی زۆربەی هەرە زۆری سەرتاپای کوردستانی دابەشکراوی گرتۆتەوە و لە پاڵ زۆربەی ووشەکانیشدا لەنێوان کەوانەیەکدا کورتکراوەی دیالێکت، نیمچە دیالێکت و ... دەستنیشان کردووە.

هەر ووشەیەکی سادە واتای تایبەتی خۆی لێکدراوەتەوە و ئەگەر بەرامبەرەکەی ماکێکی دی هاو واتای هەبوو کۆما (،) یەکیان لەنێواندا داندراوە، ئەگەر لە مانایەک زێتر بوو پنتێک (.) خراوەتە نێوان، وەک: ئال (باک.): ئالاً. ئاڵ، ڕەنگی سوورێکی کاڵ، سوورێکی سووک و کراوەوەیە. لا، کن، ڕەخ، ڕۆخ، لە ووشەی (ئالان) قوڵە کراوەتەوە لە نێو لزگەی سەرچاوەکانی ئەم فەرهەنگەدا. پەنجەی بالاًبەرزەی دەست.

ئەو ووشانەی، کە داڕێژراو، یا لێکدراون خراونەتە سەر ووشە سادەکە و لەوێدا باسکراون، وەک: ئاو: (باک.) ئاف، (هەورا.) ئاوی، یاو. ـــ بران: چکان، چکبوون، جکیان. ـــ خووار: هێنانەخووار. ـــ دان: ئاقدان. ـــ دار: بەئاو، تەڕ، پاراو. ـــ ڤە: هێنانەوە. لەناوی (ئاوێستا) کورتکراوەتەوە بۆ لزگەی سەرچاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە.
ئەو ووشانەی واتاکانیان لێک نەدراونەتەوە و بە بۆشایی لەنێو دەستنووسەکەدا بە جێماون، هەوڵمان داوە واتاکانیان پڕ بکەینەوە و نیشانەی (*) یەکمان بۆ داناون، بۆ ئەو ووشانەی، کە واتاکەیان نەزانیوە و لە هیچ سەرچاوەیەکی فەرهەنگیدا دەستمان نەکەوتووە نیشانەی (؟)مان لە پاڵ داناون، وەک: ئاولیخو: (؟).

لەنێو دەستنووسی ئەم فەرهەنگەدا تیپی (ص، ط)یش هەبوون، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم دوو دەنگە لە زمانی کوردیدا نین و زۆربەی هەرە زۆری ئەو ووشانەی، کە لەنێو خانەی ئەم دوو دەنگەدا دانابوون، هەر لەنێو (س، ت)شدا هەبوون، بۆیە ئەوانم خستنە نێو تیپەکانەوە.

ئەوەی شایەنی باسە بەهەشتی گیوی موکریانی تیپەکانی ئەم فەرهەنگەی تا کۆتایی تیپی (ک)ی پاکنووس کردبوو، من تیپی (گ)ێ و د. عەزیزگەردی تیپی (ل، م) و کاک ئەحمەد تاقانە تیپی (ن، و) و کاک شێرزاد فەقێ ئیسماعیل تیپی (ه، ی)مان پاکنووس کرد.

## زمانانی کوردستانی سەردەمی کۆن

## (خووری و ئوورارتوو)

کۆنترین شێوەی ووشەی کورد لەنێو نووسراوانی مێخیدا لە فۆرمی (مات کورداکی)دا هاتووە، کە بۆ هەزارەی سێی پ.ز. دەگەڕێتەوە، ووشەی (مات) هەوارگە دەگرێتەوە (کی) نیشانەیەکی سۆمەرییە بۆ زەوی، لەو سەردەمەدا ئەم نێوە باکووری ڕۆژهەلاًتی سوریەی ئەمڕۆی گرتبووەوە (Groneberg 1980).

لەبەر ڕۆشنایی ئەو دۆکومێنتانەی، کە لە کوردستاندا دۆزراونەتەوە، ئەوە ئاشکرا دەبێت، کەوا لە هەزارەی سێی پ.ز.دا بەواتا بەر لە هاتنی هۆزانی ئاری زمانی وەک میتانی و هۆزانی ئێرانی زمانی وەک ماد و پورث و سەکەس و.. بۆ کوردستان، مرۆڤێکی کوردستانی بەزمانی خووری / / هووری دواوە، کە زمانێکی زاگرۆسی بووە و لە دواییدا شێوە پەرە سەندووەکەی نێوی ئورارتووی لێندراوە.

خووریـیـان نێزیکـەی هـەزار ساڵێک دەسـەڵاتداریتیان لـە وولاتـی کـوردەواری ئـەمڕۆ و تـا ڕادەیـەکیش هـەرێمانی دەوروبـەریدا هـەبووە ، بەڵگەش بۆ ئەمـە ، کـە کوردسـتانی ئـەمڕۆ مـەڵبـەندی خووریـیـان بـووە ، ئـەو شـوێنانەن ، کـە لـەنێو شوێنەواری نووسراودا هاتوون و فەرمانڕەوایـەتییان تێداکـردووە و ئـەمڕۆش هـەر کوردنشـینن ، خووریـیـان شـوێنەواری نووسراویان بە زمانی خۆیـان ، کـە خووری بـووە ، هـەروا بـە زمـانی ئەکەدیش بۆ بـەجێ هێشـتووین ، لـێرەدا ئـەو شـوێنەوارە نووسراوانە دەخەمە بەرچاو ، کە بـە زمـانی خووری نووسـراون ، لەوانـە شـوێنەواری نووسـراوی پاشـای خووری تیش ئەتـەل ( ٢٠٤٥ ـ ٢٠٣٧ پ.ز. ) ، ئەفسـانەی پاشـایەتی لـە ئاسمـانـدا ، ئەفسـانـەی گلگامێشـی سـۆمەری ، چیرۆکی ڕاوچـی (کەشی ) ، کۆمەڵێک نامـەی پاشای میتانی ـ توشراتە ، کە لـە (تـل العمارنـة) دۆزراونەتـەوە ، ئەرشیفی بنەماڵـەی وللـو ، هەروا ئەرشیفی بنەماڵـەی تیخیب تیللای خووری و .. (Gadd 1920 ، د. جەمال ڕەشید ١٩٨٨ Groz 1988 ، د. کوردستان موکریانی 1995).

ئورارتوویـان لـەنیوەی یەکـەمی هـەزارەی یـەکی پ.ز. دا هێزێکی ڕامیـاری بـەتوانای بـاکووری میسـۆپۆتامیا بـوون و خوداوەندی مـەزنیان (خاڵدی) لـە موساسیر (میچیسیری ئەمڕۆ ) لە نزیک ڕەواندز بوو ، دەسەڵاتداریتیشـیان گەیشـتبووە لای کێوەکانی کاف و هەبوونی کاریگەری زمـانی ئەوان بۆ سەر زمـانانی کەفکازی و ئەرمەنی وای لە هێندێک کەفکازناس و ئەرمەنناسان کردووە ، هەوڵبدەن بەندیوارێک لـەنێوان زمانانی کەفکازی و ئەرمەنی لـەگەڵ زمانانی خووری و ئورارتـوودا پەیدا بکەن.

شوێنەواری نووسراو بەزمانی ئورارتوو لـە زۆربەی ئەو هەرێمانـەدا دۆزراونەتـەوە ، کـە لـەژێر سایەی دەسـەڵاتداریتیاندا بوون ، کە لـە فوراتەوە تـا بـەری باشووری وورمـێ لـە شاری مووشـەوە تـا گۆمـی سیڤان و باشووری سنووری گورجسـتانی گرتبووەوە . چوارسەد تابلۆی نووسراو بە زمـانی ئورارتـوو دۆزراونەتـەوە ، کـە بابەتـەکانی پێوەنـدی بـە بنیـات نـان ، مێژوو و ئایینەوە هەیـە ، هـەروا دە نامـەیـەکیش ، کـە زۆربـەیان بـۆ پاشـا ئەرگیشـتی یەکـەم و سـەردووری دووەم دەگەڕێتـەوە ، لـەو شـوێنەوارە نووسـراوە نێودارانـەی ، کـە بـەزمانی ئورارتـوو بۆمـان بـەجێماون نووسـراوی پاشـا ئیشـپوینی کـوڕی سـەردووری یەکەمە ، کە لـەسەر بەردێکی کێلەشیندا تۆماری کردووە و .. (د. کوردستان موکریانی ١٩٩٥ ).

ڕووداوانی مێژوو دەورێکی باڵایان بینیوە لـە نەهێشتنی زمانان و زاڵبوونی زمانێک بەسەر زمانێکی دیـدا و هـەروەکو لـەمەوبەر باسم کرد دانیشتوانی کۆنی کوردستان بە زمانانی خووری و لـەدواتردا ئورارتـوو دواون ، کـە هیـچ بـەندیوارێکی بـە زمانانی ئاری و هەروا بە زمانانی ئێرانیوە نەبووە ، بەڵام لـەگەڵ پەیدابوونی هۆزانی ئـاری زمـانی وەک میتـانی و لـەدواتردا هۆزانی ئێرانی زمانی وەک ماد و پورث و سەکەس لە کوردستاندا بەرە بەرە زمانانی خووری وئورارتوو لـەنێو چوون.

## بڵاوبوونەوەی هۆزانی ئاری زمان

هۆزانـی ئـێرانی زمـان ، کـە لـەنێو خـاکی ئـێرانی ئـەمڕۆ و ئاسیای نێوە ڕاسـتدا بڵاوبوونـەوە ، نـە ئـێران و نـە ئاسـیای نێوەڕاست خاک و خۆڵی بنچی ئەو هۆزانە نەبوون ، کە بە زمانی ئێرانی دوواون ، بەڵکو دانیشتوانی ئەسلی ئەم هەرێمانـە بـە زمانی نێوچەیی خۆیان کسەیان کردووە و زمانەکانیشیان ئێرانی نەبووە.
تێکەڵاوبوونی زمانی هۆزانی کۆچەری ئێرانی زمان لـەگەڵ زمانانی ناوچەیی دانیشتوانی ئێران و کوردسـتاندا لـە هـەزارەی دووی پ.ز.دا بووە.

هۆزانی ئاری زمان لە دوای نیشتە جێبوونیانداو تێکەڵاو بوونیاندا لەگەڵ دانیشتوانی ئەو هەرێمانەی دەستیان بەسەر داگرت ، نووسراوی کۆنیان بۆمـان جێهێشتووە ، وەک نووسراوی ڤیدی لە هندستان و نووسراوی ئاوێستا لە ئێراندا.
بە تێکەڵاوبوونی زمانی هۆزانی ئاری زمان وەک میتانی لەگەڵ زمانانی خووری و ئورارتوودا و لە دواتردا پەیدا بوونـی هۆزانی ئێرانی زمان لەنێو کوردستاندا و تێکەڵاوبوونی لـەگـەڵ زمانـانی ناوچـەییدا زمـانی کـوردی لـە کوردسـتاندا سـەری هەڵدا.

کۆنترین شوێنەواری نووسراو بە زمانی کـوردی، کـە تـا ئێستـە کەوتبێتـە بەردەست دۆکومێنتـەکانی هەورامانـە لەگەڵ تێکستی کورتی کلێسەییە.

بەڵگەنامەکانی هەورامان لە دێی پاڵنگان نێزیک کەلاّی نەردەلان ــ تەنگی بەر لـە سەرچاوەی نـاوی سیروانەوە لـە کوردستاندا دۆزراوەتەوە، ژمارەی بەڵگەنامـەکان زۆر بوون، بـەلاّم هـەر سێ دانـەیان لـە سـاڵی ۱۹۰۹ دا بـە هۆی دکتـۆر سەعیدخانەوە گەیشتونەتە بەردەستی شارەزایانی ڕۆژهەلاّتناسی ڕۆژاوا، دووان لەو بەڵگەنامانە، کـە بۆ ساڵانی ۸۸ و ۲۲ی پ. ز. دەگەڕێنەوە بە زمانی گریکی نووسراون لـە ساڵی ۱۹۱۵ دا لـە لایـەن پرۆفیسـۆر مینسـەوە لـە کۆڤـاری لێکۆڵینەوەی هیلینیدا شیکراوەتەوە و سێیەمینیشیـان، کـە بـە تیپـی ئـارامی بـووە و بـۆ سـاڵی ۱۲ و ۱۱ ی پ.ز. دەگەڕێتەوە لە لایەن کاولی لە ساڵی ۱۹۱۹ دا تیشکی خراوەتە سەر.

لە دوای تێپەڕبوونی سێ چارەکە سەدە لە سەر دۆزینەوەی ئەم بەڵگەنامانەدا د. جەمال ڕەشید ئەحمەد بـۆ یەکـەمین جار لە بواری ڕۆشنبیری کوردیدا تیشکی زانستی خستە سەر و بەندیواری ئەم دۆکومێنتانەی بە زمان، مێژوو و بـاری ئـابووری و یاسایی کورد و کاریگەری ناکوردیشی بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستانە پێشکێش بە نامەخانەی کوردی کرد.

ئەو دۆکومێنتەی، کە بۆ ساڵی ۱۲ و ۱۱ پ.ز. دەگەڕێتەوە و بە ئەلف و بێی ئـارامی نووسراوەتەوە لـە ڕووی نێوەڕۆکی زمانەوانیەوەی هەژارە، چونکە هەر تەنێ ۲۳ ووشەی تێدایە، کە سەر بە کۆمەڵە زمانانی ئێرانی (پورتـی و کـوردی) بێت و ۱۵ لـەم ۲۳ ووشـانەش نـاوی تایبـەتین، ووشـەکانی دی ئـارامین و هـەروا تێکستـەکە کاریگـەری سـەردەمی هیللینـی (یۆنانی)یشی پێوە دیارە، کە لەکاتی تۆمارکردنی بەڵگەنامەکەدا چەسپێندراوە.

## بەڵگەنامەی هەورامان

۱ــ شانەت ||| ق. یەرەخا ئەروتات مەیبانو پەتەسپەک بەری تورین.

۲ــ ||| .. و؟ یەکی کەرما ئەسمەک من ئەبیکە شەکەن پەلز یات.

۳ــ ڕە زیانو ئەریل بەری بەشنین داد ئەهی کولە زوزین ۱۰ ۲۰ ۲۰ ۵.

٤ــ مە من بومخوتی نا .. خ هەمی ئەدلو قیدە متە.

۵ــ شەهدین تیریک بەری ئەپینی.. بەری ڕەشنۆ ئەرشتەت.

٦ــ بەری ئەبنو گریپنهی میثر اپادی سینەک بەری ماتبەنگ.

۷ــ .. کەرما ئەسمتن کەرما زینت (؟) ئەریل من.

۸ــ پەتەسپەک کولە زوزین ۱۰ ۲۰ ۲۰ ۵.

## واتای تێکستەکە بە زمانی کوردی هاوچەرخ

۱ــ ساڵی ۳۰۰، مانگی ئەرۆتات، مەیوان پەتەسپەک کوڕی تۆرین..

۲ــ نرخی (؟) ڕەزی ئەسمەک کە (؟) داوە بۆ گەڕاندنەوەی خاوەنێتی (؟) بۆ..

۳ــ ڕەزوان ئەریل کوڕی بەشنین، ئەمەش دای، هەمووی بە گشتی (بە) ۵۵ زۆزین.

٤ــ ئەوەی کە لای خێوی زەوییە.. دانی پێدا ناوە (؟) لە پێش.

۵ــ شاهێدان تیریک کوڕی ئەپێن، ی، کوڕی ڕەشنۆ ئەرشتاد.

٦ــ کوڕی ئەبنو گریپنهی کوڕی میثراپادی، سینەک کوڕی ماتبەنگ.

۷ــ نرخی (؟) ڕەزی ئەسمتن، ڕەز دەگەڕێتەوە (؟) بۆ ئەریل، لە..

۸ــ پەتەسپەک، سەرجەم ۵۵ زۆزین.

# سەرجەمی واتای تێکستەکە بە زمانی کوردی هاوچەرخ

ئەو نیوە پارچە زەویی (ڕەز)ەی، کە بۆ ئەریل بەجێماوە، لە مانگی ئەروتات (جۆزەردان) ساڵی ٣٠٠ (سەلوکی بەرامبەر بە ١٢ وە یا ١١ ی پ.ز. )ە، لە پێش شاهێدان: تیۆیک کوڕی ئەپین، ی .. کوڕی ڕەشنۆ ئەرشتاد، ئەبنو گریپنهی کوڕی میثر اپادی، سینەک کوڕی ماتبەنگدا بە پەتسپەک بەرامبەر بە ٥٥ زۆزین پێشکێشکرا (فرۆشرا). (د. جەمال ڕەشید ١٩٨٨).

شوێنەوارێکی نووسینی دی، کە بەندیواری بەم سەردەمەی زمانی کوردێوە هەبێت، ئەو تێکستە کلێسەییەیە، کە لەپاڵ شەش زمانی دی (گریکی، ئاسوری، گورجی، عەرەبی، فارسی و تورکی) لەنێو دەستنووسێکدا دۆزراوەتەوە، کە بە ئەلف و بێی ئەلبانی نووسراوەتەوە و ترانسکریپچی هەر هەوت تێکستەکەش بە زمانی ئەرمەنی دراوە، لەم دەستنووسەدا نێوی کورد لە پاڵ ئەم تێکستەدا نەهاتووە، بەڵکوو نێوی (مار) هاتووە، کە ئەویش شێوەی گۆکردنی ئەرمەنە بۆ ووشەی (ماد) ئەوەی شایەنی باسە لەنێو فەرهەنگێکی ئەرمەنیدا، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا نووسراوەتەوە، بەرامبەر بە (مار || ماد) بە زمانی تورکی بە کورد، شێروانی لێکدراوەتەوە (د. کوردستان موکریانی سەردەمانی زمانی کوردی و کۆمەڵە زمانانی ئێرانی) ئەمەو ئەمڕۆ ئەم تێکستە بەر زمانی کوردی (دیالێکتی کرمانجی باکور) دەکەوێت، هەروا لێکۆڵەرەوەی ئەم دەستنووسە باسی ئەوەی کردووە، کەوا لە شوێنانی دی ئەم دەستنووسەدا تێکستی دی بە زمانی (ماد) هەیە و هێماشی بۆ ئەوە کردوە، کەوا (ماد)ە کانیش ئەلف و بێی تایبەتی خۆیان هەبووە.

لێکۆڵەرەوەکە وای بۆ دەچێت، کەوا ئەم دەستنووسە لە ساڵی ١٤٤١ دا لە لایەن زێتر لە نووسەرێک تەواوبوبێت و دەستنووسەکە ٣٤٦ پەڕە و بابەتی جۆراوجۆری سەردەمانی کۆن و سەردەمی خۆیدا تێدا کۆکراوەتەوە.
ئەگەرچی تەواوبوونی ئەم دەستنووسە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی پازدەم دەگەڕێتەوە، بەڵام من تێکستە کوردێکە و ئەوانی دیش دەگەڕێنمەوە بۆ کۆتایی سەدەی هەشتەم و سەرەتای سەدەی نۆیەمی زاییبنی (د.کوردستان موکریانی. سەرچاوەی پێشوو).

ئەمە و ئەو باسەی (شیخ أبوبکر أحمد بن وحشیه النبطي)یە، کە لەنێو بەرهەمی خۆیدا، کە لەژێر سەرنێوی (شوق المستهام في معرفة رموز الاقلام)ە و لە ساڵی (241)ی کۆچیدا (821 ز.) نووسیویەتی باسی جۆری نووسینی کوردی کردووە، کەوا دوو نووسەر بەنێوی (بینوشاد و ماشي السوراتي) هەموو جۆرە زانیاری و هونەر و کتێبی کوردییان کۆکردۆتەوە و ئەلف و بێیەکی تایبەتیشیان بۆ زمانی کوردی داناوە (زاری کرمانجی ژمارە (18). لاپەرە 2 ـ 3.
16ی شوال 1347 هـ -- 27 اذار/ 1929 ساڵی سێیەم. دکتۆر سەعیدخان 1935، گیوی موکریانی 1961، د.جەمال ڕەشید ئەحمەد 1988).

زمانی ئەمڕۆی کوردی لە ڕووی تایبەتێتی دیالێکتولۆژێوەی دابەش دەکرێتە سەر چوار دیالێکت:
دیالێکتی کرمانجی (کوردی) ژووروو.
دیالێکتی کرمانجی (کوردی) نێوەڕاست.
دیالێکتی کرمانجی (کوردی) ژێروو.
دیالێکتی کرمانجی (کوردی) ناوچەیی.

ئەمڕۆ لە کوردستاندا دوو شێوەی وێژەیی زمانی کوردی هەیە، کە دیالێکتی کرمانجی (کوردی) ژووروو و دیالێکتی کرمانجی (کوردی) نێوە ڕاستە، لەنێو ئەم دوو شێوەیەدا دیالێکتی کرمانجی نێوەڕاست تا ڕادەیەک هەنگاوی بەرەو زمانێکی ستانداردی کوردی ناوە، بەڵام دوو دیالێکتەکانی دی (ژێروو و ناوچەیی) ئەمڕۆ زمانی نووسین نین، بەڵکو هەر زمانی ئاخاوتنن، ئەگەرچی کەلەپوورێکی زۆر بەم دوو دیالێکتە نووسراوەتەوە.

دابەشکردنی گەلی کورد و خاکی کوردستان بەسەر چەندین دەوڵەتی زمان جیاواز و نەبوونی دەوڵەتێکی یەکگرتووی کوردی، کاری کردووەتە سەر نەبوونی ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردی. بۆ وێنە لە باشووری مەزن و بەری ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا پێرەوی ئەلف و بێی عەرەبی ـ فارسی دەکرێت، لە باکوور و باشووری بچووکدا ئەلف و بێی لاتینی و لە لایەن کوردانی سۆڤیێتی جاراندا لە پاڵ ئەلف و بێی لاتینی ئەلف و بێی کریلیش بەکاردەبرێت. جلوە و مەسحەفی ڕەشیش بە جۆرە ئەلف و بێیەکی تایبەتی نووسراونەتەوە (د. کوردستان موکریانی 1990، لاپەرە 45 ـ 48).

زانایانی کورد هەر لە سەدانی کۆنەوە بایەخیان بە زمانی کوردی داوە و بیریان لە فەرهەنگ دانان کردۆتەوە، بۆ وێنە ئەحمەدی خانی ئەمر لە ١٠٩٤ی کۆچیدا (١٦٨٢ ـ ١٦٨٣)ی زاینیدا (نەو بەهاری) داڕشت و شێخ مارفی نۆدەییش لە ١٢١٠ی کۆچیدا (١٨٦٥)ی زاینیدا (ئەحمەدی) دانا و لەم سەدەیەشدا بە دەیان فەرهەنگ نووسی کورد هێزو توانای بیری خۆیان بۆ فەرهەنگ سازی تەرخان کرد.

## ژێدەر:


Gadd j.c. 1920 Tablets from kirkuk,
RA. Tom XXII p.4q.

گۆڤاری زاری کرمانجی، ١٩٢٩ ڕەواندز، ژمارە ١٨ لاپەرە ٢ ـ ٣.
سەعیدخانی کوردستانی ١٩٢٥ نزانی. تاران.
گیوی موکریانی ١٩٥٠، فەرهەنگی ڕابەر، عەرەبی ـ کوردی. هەولێر.
گیوی موکریانی ١٩٥٥، ١٩٦٦، کۆڵکەزێڕینە ـ کوردی، فارسی، عەرەبی، فەرەنسی و ئینگلیزی. هەولێر.
گیوی موکریانی ١٩٦١، فەرهەنگی مەهاباد، کوردی ـ عەرەبی ـ هەولێر.
د. جەمال نەبەز ١٩٧٦ زمانی یەکگرتووی کوردی. بامبێرگ.
گیوی موکریانی ١٩٨٦، فەرهەنگی نۆبەرە، عەرەبی ـ کوردی. بەرگی یەکەم. بەغدا.
گیوی موکریانی ١٩٩٠، فەرهەنگی نۆبەرە، عەرەبی ـ کوردی. بەرگی دووەم. بەغدا.
شێخ محەممەدی خاڵ ١٩٦٠ ـ ١٩٦٤، فەرهەنگی خاڵ. کوردی ـ کوردی. بەرگی یەکەم و دووەم. سلێمانی.
جگەرخوێن ١٩٦٢ فەرهەنگا کوردی، بەرگی یەکەم و دووەم. بەغدا.

Groneberg B. 1980 Repertoire Geographique des Textes Cuneiforms. 3. Wiesbanden.
Groz K. 1988 The Archive Wullu Family . Copenhagen.

د. جەمال ڕەشید ئەحمەد ١٩٨٨ لێکۆڵینەوەی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری. بەغدا.
هەژار (عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی) ١٣٦٩ (١٩٨٩، ١٩٩٠) هەنبانە بۆرینە. فەرهەنگی کوردی ـ کوردی ـ فارسی. تهران.
د. کردستان موکریانی ١٩٩٠ قواعد اللغة الكردية. بغداد.
د.کوردستان موکریانی ١٩٩٥ تیشکێک لەسەر زمانی دانیشتوانی کۆنی کوردستان (خووری و ئورارتوو) هەیرن فەین.
د.کوردستان موکریانی. سەردەمانی زمانی کوردی و کۆمەڵە زمانانی ئێرانی. دەستنووسە.

# پێڕست وکلیلی

## نێوە قوڵە کراوەکانی شارووڵکەو هۆز و خێڵ و تیرەکانی نێو فەرهەنگی کوردستان

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئارا. ئارارات | بۆڵ. بۆڵی | دۆس. ، دۆ. دۆسکی | سیوە. سیوەیل |
| ئاک. ئاکرێ | بێ. ، بێج. بێجوان | دۆڵ. دۆڵەمەری | ش. شاربازێری |
| ئاکۆ. ئاکۆیان | بیت. بیتووێن | دهۆ. دهۆک | شار. شارویران |
| ئالا. ئالان | پا. پارسانی | دیا. دیاربەکر | شارە. شارەزوور |
| ئامێ. ئامێدی | پە. ، پەه. پەهلەوی | ڕەوا. ڕەواندز | شاگی. شاڵەبەگی |
| ئاو. ، ئاوێ. ئاوێستا | پر. پردێ (ئالتونکۆپری) | ڕە. ، ڕەو. ڕەوەند | شە. شەبەک |
| ئەردە. ئەردەلان | پژ. پژدەری | ڕۆژ. ڕۆژبەیانی | شەقە. شەقلاوە |
| ئەرگوو. ئەرگووش | پێ. ، پێن. پێنجوێن | ڕوو. ڕۆست | شەم. شەمزینان |
| ئەنە. ئەنەدۆڵ | پیی. ، پیر. پییران | ز. ، زاخ. زاخۆ | شک. شکاک |
| ئۆ. ئۆمەربل | پیرە. پیرەسنی | زا. زازا | شن. شنۆ |
| ئێرە. ئێرەوان | تا. تالەبانی | زەر. زەرزا | شو. شوان |
| بابا. بابان | تاو. تاوگۆزی | زەڤ. ، زەندا. زەنداویستا | شیر. شێروان |
| باجە. باجەلانی | تەر. تەرگەوەڕ | زەن. زەنگەنە | شێخ. ، شیز. شێخ بزێن |
| باد. بادینان | توو. توولابی | زر. ، زرا. زراری | شنک. شینکایەتی |
| بار. بارزان | تی. تییلەکۆ | ز. زێبار | ع. عربی |
| باز. بازیان | جا. جاف | زیی. زییتکی | عرا. عراق |
| باش. باشقەلان | جە. ، جەبا. جەباری | زییل. ، زیی. زییلی | عە. عەبدۆیی |
| باک. باکوور | جەل. جەلالی | ژاوە. ژاوەرۆ | ف. ، فە. فەیلی |
| باڵ. ، باڵە. باڵەک | جز. جزیرە | ژە. ژەنگار | قەر. قەرەچی |
| باڵک. یا (باڵە) باڵەکیان | جو. جووانرۆ | سا. سابلاخ | قەرە. قەرەداخ |
| بالی. بالیسان | جۆلە. جۆلەمێرگ | ساڵ. ساڵەیی | کە. کەرکووک |
| بان. بانە | چی. چیاکرمانج | سەش. ، سەر. سەردەشت | کەڵ. کەڵهوڕ |
| باو. باوەمەڕ | ح. حەسەنی | سەر. ، سەرگە. سەرگەڵۆیی | کر. کرمانشا |
| بەخ. بەختیاری | خا. خانەقین | سەق. سەقز | کرما. کرمانجی |
| بەر. بەرزنجە | خان. خانی | سەڵ. سەڵماس | کف. کفری |
| بەروا. بەرواری | خۆ. خۆشناو | سزیر. ئیسماعیل عوزێری | کۆ. کۆیە (کۆیسنجق) |
| بەگکۆ. بەگزادەی کۆیە | خێڵ. ، خێڵە. خێڵەسات | سع. سعێرت | کور. کوردی |
| بت. بتلیس | دا. داوودە | سل. سلێمانی | کۆک. کوردی کۆن |
| برا. برادۆست | دەر. دەربەندی | سن. سنە | کورد. کوردستان |
| برۆ. برۆتی | دەرس. دەرسیم | سۆ. سۆران | کوردی کۆ. کوردی کۆن |
| بڵ. بڵباس | دەش. دەشتەبێڵ | سوو. سوورچی | کووک. کوردی کۆن |

| بۆت. بۆتی | دەل. ، دە. دەلوو | سوور. سووریە | گەرد. گەردی |
| --- | --- | --- | --- |
| بۆتا. بۆتان | دز. ، دزە. دزەیی | سوێ. سوێسنی | گەردی (باک.) گەردی باکوور |
| گەر. گەرگەری | مامە.ما. مامەش | مو. ، موک. موکریان | هە. ، هەر. هەرکی |
| گەڵ. گەڵباخی | مام. مامساڵ | مەحموک. محالی موکریان | هەر. هەریر |
| گەو. گەوەر | ماو. ، ماوە . ماوەت | مح. ، میرە. میرمەحمەلی | هەس. هەسنی |
| گەور. گەورک | مەگە. ، مەرگە. مەرگەوەڕ | مل. مللی | هەرو. هەرووتی |
| گۆ. ، گۆرا. گۆران | مەر. مەریوانی | میل. میلانی | هەڤێر. هەڤێرکان |
| گۆی. ، گۆ. گۆیی | مەلیش. مەلیک شایی | نا. ، ناو. ناوکوڕ | هەک. ، هەکا. هەکاری |
| گول. گوللی | مەن. مەنتک | نە. نەهری | هەڵ. ، هەڵە. هەڵەبجە |
| گژ. گێژ | مەند. مەندەلی | نخ. ، نەپا. نەپاخی | هەم. ، هەمە. هەمەوەند |
| لک. لەک | مەنک. مەنگوڕ | نەو. ، نەورۆ. نەورۆلی | هەو. ، هەورا. هەورامی |
| لو. لوڕ | مەه. ، مەها. مەهاباد | وا. وان | هل. ، هەو. هەولێر |
| لە. لەهۆن | مز. مزو. مزووری | وە. وەرتی | هۆر. هۆرەماری |
| م. مار. ماردین | مش. ، موو. مووش | ه. ، هەرت. هەرتەل | یە. یەزیدی |

**ئا**: تیپی بەرایی ئەلف و بێی کوردییە. ئەرێ، ئارێ، بەڵێ: ئانی دەخۆی؟ و: ئـا. لـە ووشـەی (ئـارێ) کورتکراوەتـەوە. باشـە، چاکـە. پ: ئـەم نامیلکەیەی بخوێنمەوە باشە؟ و: ئا، ئائا. ئایا (مرازی پرسـیارە) وەکـو: ئا؟ واتا ئایا وایە، بەڕاستی وایە. (ها) مرازی ئاگادارییە، وەکـو: ئـاپێم کوتی: واتا ها ئاگـادار بـە پێم کوتـی. دا، دەسا: وەکـو: ئـاوەرە: داوەرە، دەسـاوەرە. لـە زاراوەی بـاکووردا ڕانـاوی مێیینانـە بـەدووای ناوانـەوە دەنووسێ وەکو: داکا من: دایکی من، چێلاتە: مانگای تۆ، جار جارە بـە تەنهاش بەکار دەبرێ وەکو: ئا من: هی من، ئەڤ بـزن ئامنـە. جارێ، لـە پێش هەموو چتێکیدا: ئا بـا پێت بڵێم: جارێ بـا پێت بڵێم. چ، چی، چ دەڵێی؟ کورتکراوەوەی ئاغایە وەکو: ئا نـەریان: ئاغـا نـەریان. ڕاستی؟ بـە ڕاسـتی؟ لـە زاراوەی (بـاکوور)دا ئـامرازی گەلـە وە کـوو: سـووارا (سوواران)، مرۆڤا (مرۆڤان).

**ئائا**: بـەڵێ بـەڵێ (کورتکـراوەوەی ئـارێ ئـارێ)یـە، بۆ جـەخت کردنـە. لـە کاتی واق و وورِمانێدا بـەکار دەبرێ، وەکـو: ئائـا: ئاهـا، هاهـا، حـەکوو، پیاح، هەیها، حـا، پـەح، پـەححا، واه، هـەرک، هـەو، پییـک. بۆ جـەخت کردنێیە. ئایا، ئاها، بۆ پرسیارە. ڕاستە؟ وایـە؟ بۆ قـایمکردنی بیرو بـاوەڕ بەکاردەبرێ.

**ئائل**: نارەوا.

**ئائلبوون**: زۆرداربوون.

**ئائلی**: زۆرداری، ستەم.

**ئەب**: ناوی مـانگێکی هاوینێیە بە کوردی تەباغە.

**ئابلاغ** (باک.): نامەی چەپەرخانە، پۆستە.

**ئابسا**: ناوی ئێلێکی کوردە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی قامیشلوو.

**ئابەنووس**: دارێکی ڕەش و سەختە مۆدنەو چتی تری لـێ دروست دەکرێ.

**ئابجی**: خوشک، ئا، پوور.

**ئابخانە**: ئاودەستخانە، ئاودەست.

**ئابدەست**: ئاودەست، ئاودەستخانە.

**ئابدووزەک**: ئاودوزەک.

**ئابرا**: برالە، لە کاتی دوواندنێدا بەکار دەبرێ.

**ئـابڕوو**: ئـاوی ڕوو، شـەرم، ئـاوڕوو، ئـاڤڕوو، فـەهێت، ڕەنگـی ڕوو، ڕووسـپێتی، ڕووسـپانی، نـامووس. ـــ بـەر: ئاوڕووبـەر، ڕووشـکێن، نـامووس شـکێن، ئاڤڕووبـەر، ئـەتککار. ـــ بـران: ئـاوڕووبران، جنێـو پێدران، نامووس شکان، پەردەی نامووس دڕان.ـــ براو: نامووس شکاو، پـەردەی نـامووس دڕاو، ئـەتککراو، ڕیسـوا، ڕیسـواکراو، بـەدنێو کـراو.ـــ براوی: بەدناوکراوی، ڕیسوایی، شەرم شکاوی، ئەتککراوی. ـــ بردن: بـە پەندبردن، هـەتک کـردن، بـەدنێوکردن، ڕیسـواکردن، نـامووس شـکاندن، پێکـردن، مەشـکەژەن. ـــ چـوون: بـەدنێوکران، ڕیسـوا بـوون. ـــ دار: ئابڕوومـەند، بـە ئـابڕوو، ڕووسـوور، بـە شـەرم، ئـاڤڕوودار، فەهێتـوو. ـــ داری: ئابڕوومـەندی، ڕووسووری، ئـاڤڕووداری، فەهێتوویـی. ـــ مـەند: بڕوانە: ئابڕوودار. ـــ ی: بڕوانە: ئابڕووداری. بێ ـــ: ڕیسـوا، بـێ شـەرم، ڕیسوا، بێ ئاڤڕوو، پێکراو، زمان درێژ، قاڵ، سوواو، چەختی، چەقەسوو، پەل، ڕووزەرد، ڕووڕەش، هاروهاج، قۆشمـە، ئـەتککراو، سووک. بـێ ـــ یی: بێ شەرمی، پێکراوی، سووکی.

**ئـابوور** (بـاک.): ئـابڕوویی، داوێـن پـاکی، ژیانی خۆ ڕێکخـەر، دەسـت پێوەگر.

**ئابۆر**: بڕوانە: ئابوور.

**ئابۆرهال** (باک.): هۆی گوزەران.

**ئـابۆریی** (هەورا.): دەستندە، دەم و جەم، هـۆی گـوزەران، پاشـڕۆژ، دەسـت پێوەگرتـن، گلداتـەوە. ـــ زان: ئـابۆری نـاس، وەرامـزان، وەرامنـاس، پسپۆڕی وەرامی. ـــ زانـی: ئـابۆری ناسـی، وەرامزانـی. ـــ نـاس: بڕوانـە ئابۆری زان. ـــ ناسی: بڕوانە ئابۆری زانی.

**ئـابێ**: ناوی ئالـفبای ئەبجەدی کوردییە.

**ئـابی**: ئاوی، ڕەنگی ئاوی، کەسێکی بێ ڕەنگە.

**ئابیدە**: بینای گەورە، قەڵافـەتی کەسێکی بـەڕێزو نـاودارە، کـە لـە زێـڕ یـا زێوو یامس و چتی تر دروست کرابێ، کۆتەل.

**ئـاپ** (باک.): مام.

**ئاپا** (باک.): پوور، پلک، خوشکی باب.

**ئاپتەر** (باک.): شێت، شەیدا.

**ئاپتەریی** (باک.): شێتی، شەیدایی.

**ئاپرەخ**: بڕوانە: ئەپرەخ.

**ئاپرژێن**: ئاوڕژێن، ئاوڕشێن.ـــ کردن: ئاوڕشێن کردن.

**ئاپک**: مامی گچکە واتە مامە بەڵاَن گچکە کراوەتەوە.

**ئاپۆ** (باک.): مام لە کاتی بانگکردنیدا بەکاردەبرێ.

**ئاپۆرە** (هەمە.، ڕۆژ.، جەبا.، زەن.): ئاوارە، مشـەخت، دەربەدەر.

**ئاپۆرهال** (باک.): بڕوانە: ئابۆرهال.

**ئاپۆژن**: ئامۆژن.

**ئاپێ مووس** (باک.): گەمەیەکە.

**ئاتاج**: دەست کورت، دەست تـەنگ، ئاوسەرکەم، پێداویست. پسوولـە و قەباڵـەیەکە کرێگرتە لـە خاوەن خـانووی وەردەگرێ. ـــ ی: دەست کورتی، ئاوسەرکەمی.

**ئاتەش**: ئاوور، ئاگر.

**ئاتەشە** (فە.): ئاورە، ئاگرە، نەخۆشییەکە لـە سفلس داران دەگیرێتەوە.

**ئاتەشەک**: سەودای کۆن، نەخۆشی سەودا، کە کۆن بـێ دەبێتـە ئاتەشـەک، فـەرەنگی. مـرۆی گـول دەکـا، کـە لـە وولاّخـانیش بـدات ئاوگـەڵی شـل و بەڵـەک دەکات.

**ئاتەشپەرسـت**: ئاگرپەرسـت، ئاووڕپەرسـت.ـــ ی: ئاگرپەرسـتی، ئاووڕپەرستی.

**ئاتەشخانە**: ئاگرخان و ئەتوونی گەرماو و سەماوەر و ئیتر.

**ئاتەشکەدە**: ئاوورگە، ئاهیرگا، ئاتەشگا.

**ئاتەشگا**: ئەتوون، ئاگرخانی ئاوورپەرستان. ناوی کێوێکی سەختیشە لە جوانرۆیە، کە لە پێش ئیسلامدا ئاتەشکەدە بووە.

**ئاتەشگە**: ئەتوون، ئاگرخانی ئاوورپەرستانە.

**ئاتەشی**: جوورێکە لە چەشنەکانی گوڵەباخ و سوورێکی زۆر تێرە.

**ئاتەک**: لا، کن، تەنیشت.

**ئاتەگ**: ئەتەگ، گۆشتی سەرپەراسوو، تەراد، تەروک، تەڵۆک. لاتە کەڵتووی زینییە. داوێن، دامەن.

**ئاتەڵ** (جا.): گۆڕین (بۆ جل و بەرگ).

**ئاتر** (باک.): ئاوور، ئاگر، ئازەر، ئاهیر.

**ئاتلای** (باک.): مۆڵەت.

**ئاتێ** (ئەر.): زێڕ، لە ئاڵتوون وەرگیراوە ناوی ئافرەتانیشە.

**ئاجگی** (زا.): بەرچاوتەنگ، رژد، بەرچڵ، چەپخووس، کنووس، چکۆس، قاڕنان، قرچۆک، مەندەمۆڕ، کۆنە، گزاف، ئارفەر، چەمتەنگ، بەدرەسەن، پەوور دژ، پیسۆک، چاڤتەنگ، دەزگرتی، دراڤکەتی، چاوبرسی.

**ئاجوور**: نیمە، لەتکە خشتی ئاڕێک، خرچان، زەنگوڵ.

**ئاجیل**: (هەورا.) چەرەز، شەوچەلە، شەوچەرە.

**ئاحێل**: (نە. شک.) سەر، قەیرە. کەسێکە تەمەنی لە نێوانی جحێڵی و پیریدا بێ، گەڕی ژیان چواربەشە: منداڵی، جحێڵی، ئاحێلی، پیری.

**ئاحێلی**: (نە. شک): گەڕێکە لە چوار گەڕەکانی ژیان، کە لە نێوەڕاستی جحێڵی و پیریدایە.

**ئاخ**: ڕووخان، ئاووخ، داخ، پەرۆش، حەیف، موخابین، کەسەر، ئاه، ئای، ئۆی، ئاخن، ئەی، ووشەیێکە لە کاتی تووشبوونی ئازارو یا خەفەت و کارەساتێکیدا بەکاردەبرێ. (باک.) خاک، زەوی، گڵ، خاک.

**ئاخا**: ئاغا، خاوەن دێ و سامان، براگەورە، بەگ. ـــ تی: ئاغایەتی.

**ئاخافتن** (باک.): کوتن، ووتووێژکردن، دووان، دوواندن، پەیڤین، قسەکردن. باخڤە: بدووێ، قسەبکە. نەئاخڤە: مەدووێ، قسە مەکە. باخێڤە: بیدوێنە، قسەی لەگەڵ بکە. نەئاخێڤە: مەیدوێنە، قسەی لەگەڵ مەکە. پێ باخڤە: وەدووانی بخە، قسەی پێ بکە. پێ نەئاخڤە: وەدووانی مەخە، قسەی پێمەکە. گەل ئاخافتن: دوواندن. دان ـــ: وەدووانخستن.

**ئاخاندن**: پڕکردن، ئاخنینەوە، تێ ئاخنین.

**ئاخاوتن**: بڕوانە: ئاخافتن، ئاخەفتن، ئاخفتن. (جا.) ئاژۆتن. (بابا.) خاوشکاندنی وولاغ.

**ئاخایانە**: ئاغایانە، وەکوو دەستووری ئاغایان.

**ئاخایەتی**: ئاغایەتی.

**ئاخاپۆک**: (باک.) سەقری چکۆڵە، بازی گچکە. بە یەکێکیش دەڵێن، کە حەز لە گەورەیی بکات بەبێ ئەوەی کە لێی بوەشێتەوە.

ئاخاپۆک

**ئاخە**: ئاغا.

**ئاخە بان** (باک.): گڵەبان، خۆڵەبان. ئاغەبانوو، جامەدانی.

**ئاخە بەنوو**: ئاغەبانوو، جامەدانی.

**ئاخەبانی**: (سوور.) بڕوانە: ئاخە بانوو.

**ئاخەڕەش**: (باک.) هیچ، ترەماش: ئەم ل ئاخە ڕەشێ مانە. واتا لە ماڵی ئێمەدا هیچ چتێک نەماوە.

**ئاخەفتەر**: ئاخەفتیار، ئەو کەسەیە باخووێ.

**ئاخەفتن**: بڕوانە: ئاخافتن.

**ئاخەفتیار**: ئاخەفتەر، ئەو کەسەیە باخووێ.

**ئاخەگەورا**: شووێنێکە لە باکووری ماردینێیە گەلێک قارەمانی کوردی تێدا شەهیدکراوە.

**ئاخەڵ**: ئاغەڵ، هۆڵ، گەلەخان. تەویلەی بزن و مەڕانە. هەیوانێکیشە دەورەی گیرابێ. کەڵەکە بەردی بە گەڕە.

**ئاخەلێوە**: مانگی نەورۆزییە، خاکەلێوە، ئادار، ئاخلێڤ، هەوەڵ مانگی بەهارییە. دووایی هاتن، بڕان، تەواوبوون.

**ئاخەلێوکۆتایی**: کۆتایی کارو فەرمان و هەمووچتێک.

**ئاخبان** (باک.): گڵەبان، ـــ کردن: گڵەبان کردن.

**ئاخپۆل** (باک.): قوڕشێلان.

**ئاختە**: یەختە، بارگینی ژێربارو کشت وکاڵانە.

**ئاخرکە** (باک.): جوورە مێشوولەیێکی زۆر ووردی بە ئاڵۆشە.

**ئاخسبات**: پازدە رۆژەکانی بەرایی مانگی ڕەشەمەیە.

**ئاخش** (باک.): ئۆخەی، ئۆخەیش.

**ئاخفتن** (باک.): بڕوانە: ئاخەفتن. کرانەوەی برین و کولانەوەی.

**ئاخڤاندن** (باک.): وەقسەخستن. کولاندنەوە، کردنەوەی برین، هەڵدڕین.

**ئاخڤین** (بوتا.): ئاخۆتن، قسەکردن، چونکوو مرۆ لە کاتی ئاخۆتنێدا زاری لێک دەکاتەوە، خونچە، کە بپشکووێ دەڵێن پشکۆژ ئاخڤی. کولانەوەی برین، کرانەوەی برین و کێم لێهاتن.

**ئاخکە**: قەیران، ئاهکە، ئاگە، گیانە لەلا، تەنگانە، کاتی بڤەی نەخۆشی.

**ئاخڵ** (هەورا.): خەرمانەی دەورەی مانگ و ڕۆژ. ئاغەڵ، ئاخەڵی ئاژاڵان، دیواری تەپاڵە.

**ئاخڵە** (کر.): خەرمانەی دەورەی مانگ و خۆر. (ئەردە.) دیواری تەپاڵە، لێوارێکە، کە بە گردی شتێکا دروست بکرێ لە قوڕ و ئیتر.

**ئاخڵەدان**: کۆبوونەوە، گردەوبوون، پێچ خوواردنی مار، دەورەدان.

**ئاخلێڤ** (باک.): ئاخلێڤە، هەوەڵ مانگی بەهارییە، ئاخەلێوە، نەورۆز، خاکەلێوە.

**ئاخلێڤینک** (باد.): تاوە.

**ئاخن**: (باد.) ئاخ وئاه وهەناسە هەڵکێشان.

**ئاخنران**: پەستران، داپەستران، لەخۆوە ئاخنران.

**ئاخنراو**: پەستراو، داپەستراو، هەلاخنراو، پەستاوتراو، داپەستوو.

**ئاخنراوەوە**: دووبارە داپەستراو.

**ئاخنین**: هەلاخنین، تێئاخنین، تێپەستاوتن، پەستاوتنی چتێک لەناو چتێکی دیدا.

**ئاخنینەوە:** خنین، هەڵاخنین، تێئاخنین، تێپەستاوتن، دووبارە ئاخنینەوە.

**ئاخۆ:** ئامرازی پرسیارە، ئایا، ئەریّ، هەریّ، داخوا. (باک.) تەوییلە.

**ئاخووا:** بڕوانە: ئاخۆ.

**ئاخوەوەند** (باک.): هونەرمەند، زانا. (باک.) ـــ ی: هونەرمەندی، زانایی.

**ئاخ و تف:** تف کردن.

**ئاخۆتن** (باک.): ئاخاوتن،گفتوگۆکردن، دووان، مـژوولی، (جز.) پەیڤ کرن.

**ئاخور:** ئیتر،ئیدی.

**ئاخوڕ:** ئافر، دەلاڤ، ئاوەرە، دەمگە، ئاوەڕ،کۆڵ.

**ئاخۆران** (کۆ.): هەرەج و مەرەج،پشێوی، زۆرتر بەو چەشنە بەکاردەبرێ. ئاخۆران وماخۆران.

**ئاخۆران و ماخۆران:** هەرەج و مەرەج، پشێوی.

**ئاخۆرە:** (بار.، سوور.) تەپۆ، مێشوولەی وورد و ڕەشە و پێوەدەدا.

**ئاخوفتن** (باک.): بڕوانە: ئاخۆتن.

**ئاخووێرک** (ڕەوا.): پیشکە، ئاخرکە.

**ئاخ هەڵکێشان:** هەناسە هەڵکێشان.

**ئاخیە:** سینگێکە لە تەنیشت ئاخوڕ دا کوترا بێ.

**ئاخێز** (لو.): جووڵە، ڕاسستبوونەوە. ـــ کردن: جووڵان، هەستان و چوون بۆ جێگایەکی.

**ئاخێفتن** (باد.): ڕووراندن.

**ئاخێفینی** (باک.): کولانەوەی برین.

**ئـاخین** (بـاک.): ئـاهو هەناسـە هەڵکێشـان ئـامرازی دەرد و ئـازار و نەگبەتییە.

**ئاخیینک** (باد.): ئاه هەڵکێشان.

**ئاخێوتن:** ئاژۆتن، هاتوچۆ کردنی ووڵاخ.

**ئاد** (هەورا.): ئەو؛ ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە بۆ نێر.

**ئاداب** (باڵە.، مام.): زووخاو، زۆخ، کێمی برینانە.

**ئادار** (باک.): ئاخەلێوە، خاکەلێوە، نەورۆز. نێوی مـانگی سەرەتای بەهارییە، ئازار.

**ئادارۆک** (باک.): جێژنی نویّ مانگی خاکە لێوەیە نەورۆزی دابی کۆنە. گوڵێکە سپی و بنەوشەشی هەیە.

**ئادان** (باک.): بەکەڵک، پڕ سوود، شـوێنێکە پڕ بـەرو بۆ بێ. زەوییەکە بەپیت و فەڕ بێ بۆ کشت و کاڵ.

**ئادانی** (باک.): پڕ سوودی، بە کەڵکی، پڕ بەرو بۆ یی.

**ئـادە** (بـاک.): بـژاری بـاخ و بێسـتان و دەخـڵان. ـــ کـرن: بژارکـردن، پاککردنەوە.

**ئادە** (هەورا.): ئەو بۆمێیینانە، ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە.

**ئادەم:** باوە ئادەم، بابە ئادەم، باپیرە گەورەی ئادەمی زادانە (بە پێی بـیرو باوەڕی ئایینان). مرۆ، مێر، مەردوم.ـــ ی: نەتەوەی ئـادەم. مرۆڤایـەتی، مرۆ، مێر، مەردوم، مرۆڤ.

**ئادەمیزاد:** بڕوانە: ئادەمی.

**ئادەمزاد:** بڕوانە: ئادەمی.

**ئاوەنە:** ئاوێنە.

**ئادەی** (بابا.): دادەی.

**ئادگار** (کۆ.): سیما، قەلاڤەت، ڕەنگ و ڕوو ئەندام.

**ئادۆدە** (باک.): بژار چن.

**ئادوودە** (زا.): قامیشێکی درێژە ئاسنێکی بەنووکەکەیەوە، بن میچی پێ خاوێن دەکرێتەوە. (باک.) بژارچن.

**ئادیّ** (هەورا.): ئەوان بۆ کۆی نێرینەو مێیینەیە.

**ئادی:** ئەددی، ئەدی، ئەیی.

**ئادیان** (زا.): تیرەیێکە لە ناوچەی بەرواریدا.

**ئادیەمان:** شارێکی کوردانە لە نزیک مەلاتیا.

**ئاذ** (هەورا.): ئەو؛ ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە بۆمێ.

**ئاذە** (هەورا.): ئەو؛ ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە بۆ مێ.

**ئاذیّ** (هەورا.): ئەوان؛ ڕاناوی دەستە کەسێکی سێیەمە سا نێر بێ یا مێ.

**ئـار:** گۆیا یـەکێک بـووە لـە ڕزگاربووەکانی کـوولاک تۆفـان، هێندێکیـش دەڵێن کوڕی نوحییە. ئاگر، ئاوور. ئارد، هارد. (هەورا.): خۆزگە.

**ئارگا:** (هەورا.) ئاوورگا، ئاوورگ.

**ئارا** (باک.): ئایا، ئەریّ، ئامرازی بانگ کردنییە. ڕازێنـەوە. بـە دووایـی ووشانەوە دەنووسێ وەکوو جیهان ئارا، ڕەزم ئارا، ئەنجومەن ئارا.

**ئارابخا:** ناوی کۆنەی شاری کەرکووکییە.

**ئارارات:** چیای ئاگرییە.

**ئـاراز:** ڕووبـارێکی گەورەیـە دەکەرێتـە سـنووری کوردسـتان و یـەکێتی سۆڤیەت.

**ئاراستە:** ڕازاوەوە، ڕازیاگەوە، بە دەق.

**ئاراس:** بڕوانە: ئاراز.

**ئاراستن:** ڕازاندنەوە. (زا.) خستنە پشت گوێ.

**ئاراڤ** (باک.): کەرستەی جووتی. (بـاک.) ئـاراو. ڕایـەڵی یەکـەمی جۆلاّیانە.

**ئـارام:** نـەرم، هێـوڕ، دنـج، هـاوێش، لـە سـەرەخۆ، هێـدی، هێمـن، ئۆقرەگرتـن، هێـواش، بێ پێژن، نشمی، هێـواش، تـەپس، هـەدار، نێـوی نێرینانـە. ـــ بـوون: ئۆقرەگرتـن، هێـدی بـوون، دامرکـان، داکاسـان، حەسانەوە، تۆتکەکردن، ستارگرتن، هەدادان، پشوودان، تەوتین، دامـران، دارمان، داکەوتن. ـــ گرتن: تەبتین، وورینگ گرتن.حەجمین. ـــ نەگرتن: دانەکاسان، چرووسانەوە، چەوسانەوە. ـــ لێهەڵگرتن: جاڕس و هەراسان کردن. ـــ کردن: هێمن و هێدی کردنەوە، دامرکاندن، نـەتڕاندن، تـەبتاندن، دابینکردن، هۆلکاندن. لەسەرەخۆ برۆ. تووانا، وورینگ.

**ئارامەنە** (ئەردە.): هەژار، بێ نەوا.

**ئارامگا:** ئارامگە، شوێنی لێ حەسانەوە، ستارگا، وەقرەگا، گۆڕ، تا، تەو، وەقرە، وورینگ، نەرمی، تەبایی، ئاسایش، وەرم، بەلیبۆر، نەرمی.

**ئارامی:** هێمنی، هێواشی، داکاسان، هێوەرە، هێووری، ئاسوودەیی، دنجی، هەداری. ــــ لێ هەڵگرتن: جارِس و هەراسانکردن. ــــ دان: دامرکاندن. ــــ دەر: دامرکێن. نا ــــ: پشێوی، ئاڵۆزی، ئاژاوە. بێ ــــ: گلاراو.

**ئاران:** (باد.) خرۆشان، کولانەوەی برینان. (باک.) هاندان، فیتدان، بثارە: هاندە. هارِران، هووردکران. تورِەبوون و ئاگرتێ بەربوون لەبەر جنێو و هەرِەشە وچتی ناخۆش. خراکردن، گەندکردن. (ئەردە.) نەرمان، زەوی رِێک و نەرمان، گوشتە زەوی، کە بۆ کشتوکاڵ دەست بدات.

**ئاراندن:** هارِین، هووردکردن، کولاندنەوە، خرۆشاندن، هاندان، فیتدان، تورِەکردن و ئاگر تێبەردان لەبەر جنێوو هەرِەشەو چتی ناخۆش.

**ئاراو:** پاشماوەی کەفاوێکە، کە جل و چتمەکی پێ شۆرابێ و پارچە کەل وپەلی تری پێ دەشۆن، ئاراڤ.

**ئارایش:** رِازاوەوەیی، جوانی، دەق. بەزەک، تاس ولووس.

**ئارایشتکردن:** خۆلە دەقدان، بەزەک کردن، دەقدان.

**ئارایشگەر:** دەقدەر، رِازێنەوە.

**ئارە** (باک.): ئارد.

**ئارەبانە:** عەرەبانە، گالیسکە، عەرەبانەی دەخڵ و دان کێشانەوە، گەردوون، گرگرۆک.

ئارەبانە

**ئارەزوو** (کە.): ئەڵها، ئارزۆزە، (باک.) هێڤی، حەز، دڵبزووتن، تاسە، نیاز، مگێز، دڵخوواز، گاوین، گاڤین، ویست، کەرۆژ، ڤێن، ڤان، هیوا، مراز، خوەستەک، داخوواز، داواخوواز، دڵخوواز، ئاوات، کام، ڤیان، ئومێد، دڵ بۆچوون. ــ بوون: حەزکردن، دڵ بۆچوون. ــ کردن: حەزکردن، دڵ بۆچوون. ــ بوون: دڵهەبوون، بژیان. ــ دار: بە تاسە، ئارەزوومەند، بەداوو دڵ، بەتاسە، بە تاسەوە. ــــ داری: ئارەزوومەندی. ــــ کردن: دڵهەبوون، بژیان.

**ئارەزوومەند:** ئارەزوودار، بەهیوا، بە ئومێد، بینەکار، خووین کەل، مریکانە، ئومێدەوار، بە هومێد، کەسێکە، کە زۆر دڵی بە شتێکەوە بێ.

**ئارەزوومەندی:** ئارەزووداری، ئومیدەواری، هەویاداری، مرێکاری، دڵ بە چتێکەوە بوون.

**ئارەزووی پلەوەر** (بابا.): ئارەزووی سەرکەوتن.

**ئارەزووی دیدار:** تاسووخ، بێری.

**ئارەزووی سەرکەوتن:** (بابا.) ئارەزووی پلەوەر.

**ئارەسە:** ئافەرین. ــ کردن: ئافەرین کردن.

**ئارەش** (هەورا.): ئارەقە، (هەورا.) هارەش.

**ئارڤانە** (باک.): ئار، ئارد.

**ئارەق:** مێوژاو، مەی، لە ئاوی ترێ و مێووژی دروست دەکرێ و سەرخۆشی دێنێ.

**ئارەقە:** خووەی، خووێ، خوویە، ئارەش (هەورا.) هارەش، خووە، ئەو تەرِاییەیە، کە لە لەشی مرۆیان یا هەمووگیان لەبەرێکی لە گەرمان یا لەبەر ماندوێتی پەیدا دەبێ و لەبن موو دێتەدەرەوە. ــ کردن: خووەی دان.

**ئارەقچن:** (ئەردە.) دێمەک، مەهار، چیلکەیەکی گچکەیە، کە لەپەرِەی کەپۆی ئاژاڵ و ووشترانی دەکەن. تەقیلە، تەلک، گوورزۆ، ئارەخچن، ژێرکلاو.

**ئارەقچنیاگ:** تەبووبوورگ، لە کار دەرهاتوو، ئەسپی خاراو.

**ئارەقفرۆش:** مەیفرۆش.

**ئارەقگیر:** نەرمەزین، نمەزین، ژێرزین، تەکەڵتوو، ئەوەیە دەخرێتە بن زینییەوە.

**ئارەگۆز** (رەوا.): بروانە: ئاڵووگۆرِ.

**ئارەمت:** (هەورا.) دارِێژەر.

**ئارەو** (فە.): تات. حارەب. ــ ستان: حارەبستان.

**ئارەوانە:** ووشتری مێیینەی چووار ساڵانە.

**ئارەوی:** زمانی حارەبی.

**ئاربەشک** (باک.): چەخماخ.

**ئارتلاخ** (باک.): ئەو کەسەیە، کە بەدزی بخوازێ چتێکی لە شووێنێکی نهێنی دەربخا.

**ئارتوون** (باد.): دۆژە، ئاگرخان، ئاوورخان، جەهەننەم.

**ئارچەن** (باک.): چەنەگە.

**ئارخاف** (باد.): پەڵوویەکی کەمێک ووشکە، کە تەنها بە ئاردو رِۆن دروست دەکرێ.

**ئارخەفک:** (باک.) پەڵوو، پەڵوولە، جووره ناوساجێکیشە یا کولێرەیەکە، کە شەکرو رِۆنی لێدرابێ.

**ئارد:** ئار، هارد، ئارڤان، هاردی، (هەورا.) ئاردە، دانەوێڵەی هارِاو.

**ئارداف:** (باک.) فێڵ، فرت و فێڵ، فەن، چڤ، داو، تەڵە.

**ئاردبێژ:** ئەو ئاردەیە، کە بەرداش لە کاتی سوورِان و خولخواردنێدا فرِێی دەدا. زاردرِاوی زمان شیرین و ناشیرین.

**ئاردە بارە:** ئاردێکە خاوەند باراش بەخۆشی خۆی دەیدا بە ئاشەوان و بۆی قوولکە دەکات.

**ئاردەبرنج:** ئاردێکە لە برنج پەیدا بێ.

**ئاردە پێچ:** جووره هەڵوایەکە لە ئاردی دروست دەکرێ.

**ئاردەتوو:** ئاردی تووی کوتراوو بێژراوە.

**ئاردەسوار:** پیرخەنیلە، ئاردی وورده ساوارییە.

**ئاردەشان:** ئارداوێژ، چتێکە ئاردی لە بەرداش دوور دەخاتەوە لەکاتی هارِینیدا. ئەو ئاردەیە، کە لەکاتی خولخواردنی بەرداشەکە دەرِژێتە بەر دۆولیان.

**ئاردەڵ:** پاسەوان، کێشکچی، یاساووڵ.

**ئاردەمشار:** ئاردێکە، کە لە دەمی مشاری هەڵدەوەرێ.

**ئاردەوا:** ئاردە پێچ، لۆلکە، پەڵوولە هەڵوای ئاردو دۆشاوییە.

**ئاردەوارە:** ئاردەبارە.

**ئاردەیۆ یاگێ** (هەورا.): هێنانەوەجێ.

**ئاردەی** (هەورا.): هێنان.

**ئاردماڵ**: بڕێتییە لە تەختە دارێکی نیوە گرد کلکە دارێکی درێژی تێ براوە بۆ ڕاکێشانی ئارد لەبەر دڵیاندا بۆ ئەوەی ماوەی ئاردەشان باشبێ تا بەرداش لەگوڕنەکەوێت.

**ئاردکێش**: دارێکی درێژو تەختەییێکی پانی بەسەرەوەیە، ئاشەوان ئاردی پێ ڕادەکێشێتە دەرەوە، ئاردماڵک.

**ئاردماڵک**: چتێکە لە دوای تەواوبوونی باراش دەوروپشتی بەرداشی پێ دەماڵرێتەوە.

**ئاردن** (هەورا.): هێنان، هاووردن.

**ئاردنەنەقیاگە** (ئەردە.): ئاردی دانەبێژراو.

**ئاردوو** (باک.): ئاگرکەوتنەوە، ئاوورددوو.

**ئاردو ڕۆن**: (ئەردە.) هەڵوا، کە لە ئارد و دۆشاو دروست کرابێ.

**ئاردی**: (باک.) هەڵوا، ئاردەوا.

**ئاردی بنداغێ**: (خۆ.): ئاردی ساوارێیە.

**ئارزان** (باک.): هەرزان. ئاردی بڕوێشییە.

**ئارزەن**: (باک.) شەوێلکە، ئێسکی چەنەگەیە.

**ئارزی**: (باک.) سەرمایە، ماڵی تایبەتی. دەڵێن: دوکانا من ئارزییە. واتا هەرهی خۆمە. ئارەزوو.

**ئارزێنج**: (باک.) میچی سەربانی.

**ئارژنگ**: دار بەڵاڵووک.

**ئارسم** (باد.): پسکە، درم، هەڵامەت، پەسیو، باهۆڕ، زەکەم.

**ئارسمی** (باد.): هەڵامەتدار، پەسیودار، پسکەدار.

**ئارشووژن** (باک.): بەندروو، ئاژفتە.

**ئارڤانە** (باک.): ووشتری مێ.

**ئارڤان گەرسکرن**: باراش هاڕین و لێکردن.

**ئارڤان** (باک): باراش. ئارد. ـــ هێڕدن: (باک.) باراش لێکردن. ـــ هوورکرن: باراش لێکردن.

**ئارگا**: (هەورا.) ئاگردان.

**ئارڤان بارکرن**: باراش بارکردن.

**ئارگۆن** (باک.): ئاورین، ڕەنگی ئاگری.

**ئارگووشک** (باک.): شەوێلکە.

**ئارگوون** (باک.): تەندوور.

**ئارماز** (باک.): گرگرە، غەرغەرەیە وەکوو هی سەرچاڵاوان.

**ئارمانج** (باک.): ئامانج، نیشانە، مەبەس.

**ئارمووش**: ئاوریشم.

**ئارمووشە**: کێوێکە کەوتۆتە باشووری ڕۆژ هەڵاتی ڕەواندزێ.

**ئارنج**: ئاخیە، مێخ زنجیر، مێخ سندان.

**ئارنگ**: گیایەکە. (باک.) جۆرە نەخۆشییەکە تووشی مەڕو بزنان دەبێ، شەلکە.

**ئارۆ** (هەورا.): ئەمڕۆ، ئیرۆ، ئیمڕۆ.

**ئارووو**: (فە.، سوور.، دەر.، کۆ.، هەو.) هاروێ، خەیار. (باک.) شەوێلکە. مەلاشوو، ئاسمانەی ناو دەم.

**ئاروانە** (باک.): ووشتری مێی چووار ساڵانەیە.

**ئارۆزە** (باک.): ئارەزوو.

**ئارۆشە**: شەوێلکە، لاجانگ.

**ئارۆنیا**: چیایەکە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕەواندزێ بەلای حاجی ئۆمەرانەوە.

**ئارووشک** (باک.): باوێشک.

**ئاروفتە** (ئەردە.): تەنراوێکە، کە چووبێ و تان و پۆی دەرکەوتبێ.

**ئارۆک** (باک.): جۆرە کفتەیەکی پانە لە ساوار و گەفەکوتاوێ دروست دەکرێ. کفتەی گۆشتی سوورکراوەیە.

**ئاروگۆڕ**: ئاڵشت، ئاڵ و گۆڕ، پێک گۆڕینەوە.

**ئاروولە** (کۆ.): گیایەکی کێوییە بە کاڵی و کوڵیوی دەخورێ.

**ئارومۆرە**: نیشاستە و مۆرە.

**ئارۆنی**: (؟).

**ئارهان** (باک.): کولانەوە، وەئێش هاتنەوەی برین، ئازارە بە هۆی ئاگرەوە.

**ئارهاندن** (باک.): کولاندنەوە، داغکردن.

**ئارهایی** (باک.): ژانی کولانەوە، ئازارێکی هەمیشەییە لە ئەندامێکدا، تووشی کێشە و ڕووشەهاتن.

**ئاری**: (باک.) خۆڵەمێش، مشکی خۆڵەکەوە. ئاری نەژادێکی خانەدان و پێست سپییە نەتەوەی کوردیش لەو نەژادەیە.

**ئاریان**: بڕوانە: ئاران.

**ئارێ**: بەڵێ، ئەرێ. ئاها، هاها: واە چەند جووانە! بۆ پرسیارە: ئەرێ؟، ئایا؟

**ئارێ ئارێ**: بەڵێ بەڵێ، بۆ واق و وڕمانێش بەکاردەبرێ، ئاها، هاها، واە.

**ئارێخ** (باک.): دارە درێژەکەی عەرەبانەیە و بەگولیخ و زنجیرێکیش دەڵێن، کە وڵاخی پێ دەبەسترێتەوە.

**ئارێنە** (باک.): جێگایەکە لە لەش کەوتۆتە لای سەرەوەی ڕانان و خووارەوەی لەش.

**ئارینۆک**: لەتکە نۆک، لەپە.

**ئارێنج** (باک.): جوورە دومەڵێکە لەبن باخەڵ دێ.

**ئارێنێ**: بۆ سەرسوڕمان و گوێ نەدانێ بەکاردەبرێ.

**ئاری باری** (باک.): ئالوو بالوو، گەراز، میوەی دارێکی بەڵاڵووکییە، بەڵان لە بەری بەڵاڵووکێ گەورەترە.

**ئاریش** (باک.): هۆش، وورە، هێزی وورە.

**ئاریشمەن** (باک.): بەهۆش، وورەدار.

**ئاریکار** (باک.): یاریکار، یاریدەدەر.

**ئاریکاری** (باک.): هەرەوەز، یارمەتی، (دەر.) هاریکاری، هامەیاری. (هەورا.) گەل کردن، (هەو.) زبارە.

**ئارین**: هاڕین.

**ئارینەک**: (باک.) ئاگاداری.

**ئارینج**: بڕوانه: (ئاریَنج).

**ئاریندار**: (خۆ.)، ئالـوودار.

**ئارینک**: (کۆ.)، مەلاّشوو، مەرازە، مەلاّزە.

**ئاری نۆک**: ئالّی نۆک، لەپە، لەتکەنۆک.

**ئاریی**: بڕوانە: ئاری. گەورە، بەختیار. نێوی نێرینانە، (باک.) یاریکاری، یارمەتی. خۆڵەمیش.

**ئاز**: ئازا، ڕاست، ساغ. چاو لە دوویی، قارنانی، ئازوەری. چاڤ کووری. (باک.) توندوتۆڵ، پیا، (فە.) هێز، تین.

**ئازا**: دلێر، گیانداری نەترس، گەڕناس، خورت، پڕدڵ، کەلەش، نەهیتە، شێر جەنگ، دینەمێر، شامبۆز، شلێل، بلووێر بەزێن، شێردڵ، شەهلەوەند، وەن، وەند، زیخ، کورد، خۆشمێر، گەرناس، تووشماڵ، خوێنگەرم، گوستاخ، تەڕدەست، دیواندڕ، چاوسوور، چاڤ سۆر، چاڤ شار، سەلەحشۆر، دلّپڕ، چەلەنگ، شامێر، شەهمێر، بێ ترس، بێ باک، زاتدار، بەزات، توانا، وایسۆ، ئەگید، زاخ، مێرخاس، ڕەند، جەربەزە، وەند، چارشا، بە جەرگ، دلاّزا، نەترس، مەرد، جەرگدار، بدەک، قارەمان، پالّەوان، ڕووقایم، دلّقایم، بزراف، بۆکە، ناگۆرە، پۆزبەران، جامێر، بهناف. کوڕەباف، هالان، وەن، ئازاسەر، ژێهاتی. زرنگ، زیرەک. جوامێر. زوو، گورج. نا ــ: بێ زات، حیز. نا ــ یی: بێ زاتی، حیزی. گوێزی ــ: گوێزێکە بە کاکڵ دەربێ و ساخبێ.

**ئازا جەوت**: (هەورا.)، تێکولّی بنەوەی بە ڕوویە.

**ئازاد**: نێوی نێرینانە، سەربەست، سەربەخۆ، بەڕەلاّ، تەرخان، بسەرخووە، پێ پێشگر، بسەرخووە، ئازاسەر، بەرخووەدار. ــ بوون: بەربوون، سەربەست بوون، بەڕەلاّبوو، ڕاهی. ــ کردن: سەربەست کردن، بەڕەلاّکردن. گەردن ــ کردن: لێ خۆشبوون، بەخشین.

**ئازادە**: سەربەست.

**ئازادەڕیی**: (باک.) ئازادنامە.

**ئازادنامە**: ئازادڕیی.

**ئازادی**: سەربەستی، سەربەخۆیی، ئازاسەری، تەرخانی، بسەرخوەیی، پایدۆسی، لە ژێر دەستی دوژمنان ڕزگاری هاتن. ــ پەرست: ئازادی خوواز. ــ پەرستی: ئازادی خووازی.

**ئازادی خوواز**: سەربەستی خوواز.

**ئازار**: مانگی مارت، کە (٣١) ڕۆژە، مانگی نەورۆزێ، گولاّن. جەفا، دەرد، کۆتەک، گووج، بێکاری، جزار، دەردەساری، دەردەسەری، نەستێل، ئێش، ژان، ڕەنج، چەرمەسەری، تالاّو، دەوس، هێش، ئەوزۆر، کوێرەوەری، سەخلّەت، پەتپەتێن، ئێشی ئەندام. ــ دان: ئەنراندن، ئەرناندن، هێش پێ گەیاندن، بن پەنج کرن، چەوساندنەوە، چرووساندنەوە، تەرپلاندن، دەسنین، دەوساندن، چەرمەسەری دان، گۆڕە و شاردان، زەباندن، کەڤاندن، کێشەماندان، ئێشاندن، ئێش پێگەیاندن. ــ کردن: بڕوانە: ئازاردان. ــ پێ گەیاندن: بڕوانە: ئازاردان. ــ کێشان: چەوسانەوە، چرووسانەوە، لبەرخووەدان. ــ دەر: ڕەنجدەر، چرووسێنەوە. ــ دران: جەوردان، جەرگ بڕان.

**ئازارە باریکە**: دیق، (بڵ.) دەردە باریکە.

**ئازاری سیی**: دیق، (بڵ.) دەردە باریکە.

**ئازاسەر**: بڕوانە: ئازاد. ــ ی: سەربەستی و ئازادی. (باک.) ئارزانی، هەرزانی.

**ئازاڵە** (ئەردە.): سووتەمەنی، تەپاڵە، پشکەڵ، سووختی زستانێ و ئیتر.

**ئازایانە**: دلێرانە، ئەگیدانە، مەردانە، مێرانە.

**ئازایەتی**: مێرایەتی، مەردایەتی.

**ئازایی**: خۆرتی، پالّەوانی، بەجەرگی، نەترسان، جامێری، ڕەندی، ئەگیدی، چاڤ سۆری، دلێری، زاخی، پڕکێشی، زاتداری، نەترسی، بێ باکی. نا ــ: حیزی، سستی، تەپی، تەنبەڵی.

**ئازەر**: ئاوور، ئاگر، ئاڤر، ئاتر، ئاتەش. ناوی باوکی ئیبراهیم پێغەمبەری بووە، کە کوردێکی ئازربایجانییە.

**ئازەری**: ئاوورین، ئاگرین. ئازەربایجانی.

**ئازەڵک**: هەللا، کەپوورە، ناڵە، هاوار.

**ئازبەت** (باک.): تیرەیەکە لە خێلّێکی.

**ئازراندن**: (باک.) سەختی کردن، ئازاردان، سەخلّەت کردن.

**ئازرەنگ**: ڕەگی ئاووری.

**ئازرگان**: (ئەرزنجان) شارێکی کوردانە لە باکووری کوردستانێدایە ڕۆژاوای وێ هەموو ترکن و ڕۆژهەلاّت و لای خووارەوە هەموو کوردن.

**ئازربایجان**: بەشە هەرێمێکە لە کوردستانی کوێستانێدا و موکریانیشی پێ دەلّێن.

**ئازری** (باک.): برینێکە، کە کێمی تێزا بێ.

**ئازرین** (باک.): سەخلّەت بوون، لە ئازاردا بوون.

**ئازەب** (باک.): بەندەوی زێڕکڕیدە.

**ئازموون**: (باک.) تاقیمانە. ــ دان: تاقیمانەدان. ــ کردن: تاقیمانەکردن.

**ئاز**: (کۆ.) تێکەڵ بوونێکی جووان، نەخشاندن.

**ئازنج**: (باک.) خانووی بەردی بەبێ نهۆم.

**ئازنک** (باک.): خانوویەکە لەسەر یەک تاوێرە بەرد دروستکرابێ.

**ئازوەر**: چاولەدوو، قاڕنان، زگبرسی، چاوچنۆک. ــ ی: چاولەدوویی، قاڕنانی، زگبرسێتی.

**ئازوباز**: وەباڵ، ئۆباڵ: ئازوبازی تۆم بە مل.

**ئازوبەزە**: بڕوانە: ئازوباز.

**ئازۆخە**: بڕوانە: ئازووخە و ئازووقە.

**ئازووخە**: دانەوێلّە، کوویت، تفاق، پێ بژێوێکە، کە بۆ خواردن هەلّبگیرێ.

**ئازووقە**: تفاق، دانەوێلّە، کوویت، ئەو دانەوێلّەیەیە، کە لەماڵێدا بۆ خووادەمەنی دابنرێ.

**ئازوگووێز** (کە.): گووێزتنەوە، ئالّووگۆڕ، چت پێک گۆڕینەوە.

**ئازیز**: خۆشەویست. جوورە گۆرانییێکی موکریانییە.

**ئازین**: (باک.) شێوە، دەستوور.

**ئازازک**: باوێشک. ــ ی: باوێشک.

**ئاژاڵ:** مالات، وولس، وولست، مەڕ و مالات. (هەو.) دار و دەوەنی براو و تێکەڵە. (ئەردە.) گیا، ئالیک، لەوەڕ، سەوزەگیا. ــ دار: خاوەند ئاژاڵ.

**ئاژاوە** (م.): کەڵەکە و یا کۆمەڵەکردن بۆ خراپە، پشێوی، شەڕ و کێشە، ئاژاوڵە، ئاژەڵ، بێ ئارامی، شپرزەیی، ناکۆکی. ــ بوون: پەشێوی پەیدا بوون. ــ کردن: شەڕ وکێشە و هەڵلا هەلایساندن.

**ئاژاوڵە** (هەورا.): بڕوانە: ئاژاوە.

**ئاژاوڵێ** (هەورا.): بڕوانە: ئاژاوە.

**ئاژەڵ:** بڕوانە: ئاژاڵ.

**ئاژک** (باک.): بادامێکی کێوییە، (باک.) ئاژنگ، ئاژنک.

**ئاژگە:** ناوی دێیەکییە لە ناوچەی کۆیە.

**ئاژن:** ئاژنینەوە، کۆڵینەوە.

**ئاژنە** (پیر.): دارێکی کێوییە.

**ئاژنگ** (باک.): بڕوانە: ئاژک.

**ئاژنی** (باک.): مەلە. ــ کرن: مەلە کردن.

**ئاژنین:** کۆڵینەوە، تێوەدان، لەناو وەردان، تێنان و دەرهێنان. چیلکە لەناو ددان نان، سووژن لە چتێکی ڕاکردن. دەرکە داخستن.

**ئاژنینەوە:** کۆڵینەوە، ئەژنین، ئاژن، ئاژنین، ئەژنینەوە، بە پووشکەیەکی چتی گیرخواردوو لەنێو ددانانداهێنانەدەر. سووژن ئاژن کردن.

**ئاژۆ** (باک.): شووێنی پێ هەڵگرتن. ئاژوەر، شۆفێر.

**ئاژوان:** لێخوڕان، ڕانران.

**ئاژوەر:** لێخوڕ، ئاژۆ.

**ئاژۆتی:** کێڵراو، زەوی جووت لێکراو. ئاژۆتراو.

**ئاژۆتن:** ڕاناندن، ئاخاوتن، ڤش لێکرن، ڕاخین، ژەندن، ژەندن، ژەنین، لێخوڕینی وولاخ و ئاژالان، کوودانەدن، هاژۆتن، ڕانەن، ڕانەدن، ڕادان، ڕانڕادان، ئاخێوتن.

**ئاژۆدان:** هەڵکوتانە سەر. لەوەڕاندنی ئاژالاتە لە شەوی بەهاراندا، شەوارۆ: ئاژۆ بدە. واتە: بلەوەڕێنە. لێ خوڕینی ئاژاڵ.

**ئاژێر:** هۆشیار، ووشیار.

**ئاژوین:** لێخوڕین لە شووێنێکیدا؛ ئەو ڕانە لەو پاوەنەدا ــ بووە. بلاوبوونەوەی ئاژالان لە دەشتێدا.

**ئاژێن:** زوور، زبر، دڕ، درشت.

**ئاژینە** (ئەردە.): کوبیتەک، ئاسیاژەنە، چەکوچێکی ددانەدارە بەرداشی پێ بیراز دەکەن. چەقچەقەی ئاشی، بریتییە لەو دار یا لوولەیەی، کە بەستراوە بە کەویجەکەوە لە کاتی گەڕانی بەرداشدا ووردە ووردە دان دەوەڕێنێتە ناو گەرووی بەرداشەکەوە بۆ هاڕینی.

**ئاس:** (فە.) بێزار، وەڕەز، جاڕس. (ئەردە.) ناوی گەمەیەکییە، جوورە مەقەبایەکە قوماری پێدەکرێ. (باک.) ئاسک.

**ئاسا:** وەکوو، وێکچوو، وەک. زۆرترینی بە دووای ووشانەوە دەنووسێ وەکوو: خۆت ئاسایی واتا وەکوو خۆت. (ئەردە.) ئاش، ئاسیاو.

**ئاسان:** سانا، هاسان، هەدار، هێسان، هەسان، سووک، گەنگاز، بێ ئەرک، بێ گرێ و گۆڵ، کاری سووک. ــ بوون: سانا بوون. ــ کردن: هاسانکردن.

**ئاسانە:** بڕوانە: ئاستانە.

**ئاسان بژیو:** گوزەران ئاسان.

**ئاسانی:** گەنگازی، هەداری، سانەهی، خۆشی، سانایی، هاسانی، سووکی، بێ گیروگرفتی کاروبار، هێسانی، سانیلکۆکە، بێ ئەرکی، هێساهی، هەسانی.

**ئاسو** (هەورا.): ئاش، ئاسیاو.

**ئاسوان** (هەورا.): ئاشەوان.

**ئاسوبەتاڵ:** ئاش بەتاڵ.

**ئاسایی:** وەکوو، وەک، هەروەکوو؛ خۆت ئاسایی: وەکوو تۆ.

**ئاساییش:** ئارامی، هێمنی، وەقرە، بێ ئاژاوەییتی، ئاسوودەیی، وورینگ، ستاری.

**ئاسەر:** بڕوانە: ئاستەر.

**ئاسەرلێف:** بەری کەوا.

**ئاسەنەرەی** (هەورا.): داهێشتن، ڕۆهێشتن.

**ئاسەوان:** بڕوانە: ئاساوان.

**ئاست:** ڕاست، ڕووکار، جێگا، لە بەرانبەر، تەک. لە ــ تۆدا: لە ڕاست تۆدا.

**ئاستار:** ئەستەر، ئەستار، بەری کەوا و چتی تر، پەراوێزی کەوا.

**ئاستانە:** بەردەرگانە، دەرچک، بلندین، پیوە، شیپانە، پێش دەرگا، شیپک، دەریزان، دەریزانک، ئاسانە، دەرماڵ، گەووشکەن، پاگە، دارەکەی خوارەوەی چووارچێوەی دەرگایە. ئەستەنبووڵ. سایە، پەنا؛ لە ــ ی تۆدا: خۆی خستە ئاستانەکەت.

**ئاستنگ:** بڕوانە: ئاستەنگ.

**ئاستەر:** بڕوانە: ئاستار.

**ئاستەرە** (باد.): ئەستێرە.

**ئاستەم:** تۆزقالێک، تۆسقالێک، کەمووسکێک، ڕشک، عاستەم. هێدی. بە ــ: بە کاوەخۆ، لەسەرەخۆ. ــ بین: زەڕڕەبین.

**ئاستەنگ** (باد.): ڕێگایەکی تەنگ و بارێکە، کە بە دژواری مالاتی پێدا تێپەڕێ. کۆسپە، بەرهەڵست. (ئامێ.) ڕێگای پلیکانەدارە بەناو چیا و بەرقەدەکانیدا بڕوات.

**ئاستەی** (هەورا.): بەجێ هێشتن، هێلان، هێژتن.

**ئاستەی جیا** (هەورا.): بەجێ هێشتن.

**ئاستن:** بڕوانە: ئاستەی.

**ئاستوون** (هەورا.): ئاستانە، بەردەرگا.

**ئاسرم:** هەلامەت.

**ئاسرمە:** تیلمەییێکی پانە لە کورتان کە دەکەوێتە سەر کەفەڵی وولاخ. ئاشرمە.

**ئاسک**: (باک.) ڕەنگێکی بزنییە، کە لەنێوانی سوور و زەردیدابێ، خەتخەت بێ. مامز، بان بز، وەرە ماس. نێوی ئافرەتانە.

**ئاسکانی**: جۆرە هەڵپەڕینێکە.

**ئاسکە نێر**: کەڵە کێوی.

**ئاسکەزێڕینە**: ئاسکۆلەیەکی گچکەیە لە زەنگیانە دروست دەکرێ چاوەشان لە سەردەمی بەزم و ئاهەنگێدا بە دەستیانەوە هەڵی دەپەڕێنن و منداڵیش یاری پێ دەکەن.

**ئاسکۆڵان** (کۆ.): نێوی جێگایەکییە.

**ئاسکی کەتیرە**: ئاسکێکی مێینەیە، کە بە هەڵکەوت شاخی لێ ڕووابێ.

**ئاسکۆڵ**: نێوی ئافرەتانە.

**ئاسکی تاتار**: بڕوانە: ئاسکی مشکی.

**ئاسکی خەتا** (ئاسکی خوتەن): بڕوانە: ئاسکی مشکی.

**ئاسکی مشکی**: ئاژاڵێکە وەکوو ئاسکی وایە دوو ددانی درێژی وەکوو فیلی هەیە زۆرتر لەناو چیایەکانی هیمالایادا پەیدا دەبێ لەژێر زگیدا کیسەیێکی گچکەی پێوەیە لەناویدا ماکێکی خەست وەکوو دوومەڵ کۆدەبێتەوە هەر کاتێکی پڕبوو ئاژاڵەکە هەست بە دەرد و خورشتێ دەکا و زگی خۆی لە بەردی دەسووی تا دوومەڵەکە دەدڕێ و ماکەکەش دەڕژێ و لەسەر زەوی ووشک دەبێتەوە، مەردوم دەچن کۆی دەکەنەوە.

**ئاسکوند**: لای قوونی و دندووکەکانی جگیە، کە بەسەر یەکێکیاندا کەوتبێ.

ئاسکی نێر

**ئاسکی مێ**: ماسک.

**ئاسکی نێر**: (کەڵ.) کلاسک.

**ئاسمان**: فەلەک، گەردوون، ئەزمان، چەرخ، مینوو. هەوا، حەوا، لا ژووررووی سەر.

**ئاسمانە**: مەلاشوو. بن میچ، پۆشە، لاسەرگە.

**ئاسمانەدەمی** (هەورا.): مەلاشوو.

**ئاسمان و ڕێسمان**: ئاسمان و دەزوو، ووتەیێکە بۆ جیاوازی نێوانی دوو چتان لە یەکتری بەکاردەبرێ.

**ئاسمانەی دەم** (جا.): مەلاشوو.

**ئاسمانی**: شینی کاڵ، کەوو، وەکوو ڕەنگی ئاسمانێ. دەنگی ـــ ە: پیت و فەڕی ئاسمانی.

**ئاسمین**: (باک.) یاسەمەنە (گوڵ).

**ئاسن**: کانێکە گەلێک چەشنە ئامرازی شەڕێ و پیشەگەرێتی لێ دروست دەکرێ، هاسن.

**ئاسنەلان**: شوێنێکە ئاسنی زۆر بێ. پارچەپارچە. تیغی ئاسنینە.

**ئاسنبڕ**: قەڵەمی ئاسن، قەڵەمێکە ئاسنی پێ دەبڕێتەوە.

**ئاسنجاو**: (ڕەوا.، کە.، هەو.، کۆ.) قاپوو قاچاخی مسین. (پژ.) هەووڕ، (هەورا.) هەوەڕ. هەوروهۆڵ.

ئاسنفڕێن

**ئاسندڕک**: تێلی دڕاوی، دڕکە ئاسنینە.

**ئاسنفڕێن**: میغناتیس، ئاسنکێش، هێزێکە ئاسنی ڕادەکێشێ.

**ئاسنکوت**: ئاسنگەر. ـــ ی: ئاسنگەری.

**ئاسنگەر**: هەسنگەر، هێسنگەر، ئاسنکوت، ئاسنگر، هاسنگەر، کەسێکە لە ئاسنی چتی دروست بکات وەکوو: داس، تەوور، تەووڕداس، گاسن و چتی تر. ـــ ی: هەسنگەری، پیشەی ئاسنگەر.

**ئاسنۆکە**: پارچە ئاسنێکی چکۆڵەیە.

**ئاسنی**: چتێکە لە ئاسنی دروستکرابێ.

**ئاسنی سارد کوتان**: مەبەس لەو کارەیە، کە بێ سوود بێ.

**ئاسنینە**: ئاسنین.

**ئاسۆ**: ئاسوو، (باک.) بەرگە. سوو، سییلە، سووێ، ئاسووگە، (کە.، دەر.) کەلەملە، (هەو.) کەل، کەلە، (بڵ.) سووێکە، جێگای هەڵاتن و ئاوابوونی مانگ و خۆرە. تاپۆ، تارمایی.

**ئاسوو**: بڕوانە: ئاسۆ. سۆما، ڕووناکی، ڕۆشنایی.

**ئاسوویەلاس**: هیچ، هیچ وەختێک، هیچ کاتێک، توو، بیڕای بیڕای.

**ئاسوودە**: دینج، حەسانەوە، دڵنیا، ئارام، بێ خەفەت. ـــ بوون: (هەورا.) ئاسوودەبیەی، سانەوە، حەسانەوە، لە کۆڵ بوونەوە، بێندان، مەشکین، ووچاندان. ـــ کردن: پشوو پێدان، حەساندنەوە، دڵنیاکردن.

**ئاسوودەگەری**: ئاسایش، وەقرە، ئارامی، ستاری.

**ئاسوودەیی**: هێوەرە، ئاشیتی، وەرم، ئاسایش، بێ خەفەتی.

**ئاسۆک**: سێبەر.

**ئاسووگە** (کۆ.): گرد، تەپۆڵکە.

**ئاسۆگا**: دیارگا، بەرچاو.

**ئاسۆن**: (هەورا.) ئاسان.

**ئاسوێنە**: (ڕۆژ.، جەبا.) سۆرانی، فەقێیانە.

**ئاسیا**: کەرتێکە لە کەرتەکانی زەوی، کوردستانیش کەوتۆتە ناوییەوە.

**ئاسیاو**: (هەم.، دەر.، فە.) ئاش، ئاساو.

**ئاسیاوان**: ئاشەوان.

**ئاسیاو ئەسپی**: ئاشی وولاخی.

**ئاسیاو بازی**: ئاسیاو بنالگەل، ئاسلاڵە، جۆرە گەمە و یارییەکە. چەرخ و فەلەک، لەلووک، ئاشە بە تەندوورە.

**ئاسیایی**: دانیشتوانی ئاسیا.

**ئاسید** (باک.): ئاوی گەبۆل و هەڵوایە، جۆرە هەڵوایەکە.

**ئاسیدە** (سۆر.): کووکی.

**ئاسیرە** (فە.): ئەستێرە.

**ئاسیو** (ئەردە.): ڕووشە، گۆنکەڵ، گۆسرمە، تەوەرە، دەرد، تەمەرە، چورتم، چەپۆکی ڕۆژگار.

**ئاش**: دوو بەرداش بە هۆی ئاوەوە، کە تۆپ و پەڕەکە ئەسووڕێنێتەوە بە تەووژم لە کونجەوە لەناو (نێ) یا تەنوورەوە دێتەدەر بە گەڕان و خولخواردنی تۆپ و بلۆسک سەربەرد دەخولێتەوە، دانەوێڵەی دەکاتە ئارد، (دەر.، هەورا.، زەن.) ئاساو، (دەر.) ئاسیاو، شوێنی هاڕینی دانەوێڵە و کرەیە. ـــ لێکرن: ئاش لێکردن، ئاش لێ دروست کردن. (باک.، نە.، دەر.) چێشت، شێو. (باک.) ئاهار، شۆ، دەقاتی چێت و کران.

**ئاشاخە**: میوەی کۆنی ڕزیو.

**ئاشانە:** خراو، داشاخە، خەرج و باجێکە لە لایەن میری یا ئاغاوە لەسەر ئاش دابنرێ، کە لە ساڵێدا لە خاوەند ئاش بستێنرێ. فراش، مزە، مزی ئاشی. دە یا چەندیەکی مزی ئاشییە کە ئاشەوان بە ئاردی یا بە دراوی لە باراش هێڕی دەستێنێ.

**ئاشە بە تەندووری:** (نە.) ئاشە تەنووری، ئاشە بە تەندوورە، بڕوانە: ئاشە تەنوورە. گەمەیەکە.

**ئاشە تەندوورە:** ئاشێکە نێکەی وەک تەندوور وایە بە بەرد و قسڵ دروستکرێ بۆ ئەوەی، کە بە ئاوێکی کەم بگەڕێ.

**ئاشە بە تەنووری (نە.):** ئاشە بە تەندوورە، گەمەیەکی دوو دەستەییە، دەستەیەکیان بە پێوە سەر بەیەکەوە دەنێن و یەکێکیشیان پاسیان دەکا دەستەکەی تریش لە دەرەوە بازدەدەنە سەر کۆڵیان تاتێ دەکەن.

**ئاشەتەندووری:** بڕوانە: ئاشە تەندوورە.

**ئاشەڤ (هەورا.):** شێواوی، پەرێشانی، (نە.) ئاشەڤ.

**ئاشەڤ (نە.):** شێواوی، پەرێشانی.

**ئاشەڤان:** بڕوانە: ئاشەوان.

**ئاشەوان:** ئاشەڤان، (هەورا.) ئاساوان، مووشەکان، ئایشەوان، قەڕاش، لورێنە، کریچ، کەسێکە کاروباری ئاش هەڵسووڕێنی و باراشان لێ بکات.

**ئاشەوانی:** ئاشەڤانی.

**ئاشباز:** (باک.) چێشت لێنەر، ئاشچی، ئاشباز. (باک.) ـــ ی: پیشەی چێشت لێنەران.

**ئاشبەتاڵ:** ئاسار بەتاڵ، ئاش دۆڵە، ووتەیەکە ئاشەوان بە دەنگی بەرز دەیڵێ لە کاتێکیدا، کە ئاشەکەی دانی نامێنێ تا باراشی بۆ ببەن.

**ئاشبگیر:** تاڵانکردنی ئاش لەلایەن جەردەوە.

**ئاشبوونەوە:** ناکۆکی و دژی لەنێوانیدا لابردن.

**ئاشپەز:** شێوکەر، چێشت لێنەر، ئاشچی، ئاشباز. ـــ ی: بڕوانە: ئاشبازی.

**ئاشپەزخانە:** چێشتخانە.

**ئاشت:** ژیر، کۆک، پێک هاتوو، تەبا، پێک هاتوو، ڕێک کەوتوو. ـــ بوونەوە: ڕێک کەوتنەوە، پێک هاتنەوە، ڕێک کەوتنەوەی دوو یا چەند کەسان لە دووای ناکۆکییان. ـــ کردنەوە: پێک هێنانەوە، کۆک و تەبا کردنەوە، یەک خستنەوەی دوو کەس یا چەند کەسان دووای ناکۆکییان.

**ئاشتی:** تەبایی، ڕێکی وپێکی، دەنگ، کۆکی، ڕێکی و دۆستایەتی، سازان، هاشتی.

**ئاشتیخووا:** ئاشتی پەرست. ـــ ی: ئاشتی پەرستی.

**ئاشتینی:** ئاشتێتی.

**ئاشچی:** ئاشپەز، چێشت لێنەر.

**ئاشچێتی:** ئاشپازی، پیشەی چێشت لێنەران.

**ئاش چێکرن:** بیرازی ئاشی.

**ئاشخانە:** چێشتخانە، ئاشگە.

**ئاشدار:** شۆدار، دەقاقدار، شێدار، ئاهاردریاگ.

**ئاشدۆڵ:** بڕوانە: ئاش بەتاڵ.

**ئاشدۆڵە:** ئاش بەتاڵ، ئاسیاو چۆڵە.

**ئاشرمە:** ئاسرمە. هێشرمە، تەکەڵتوو، غەدزین.

**ئاشوفتە:** شێواو، پەرێشان.

**ئاشڤان:** ئاشەوانی.

**ئاشڤانی:** (باک.) ئاشەوانی.

**ئاشقۆرت (باک.):** بێ تین، لاواز، نزیکی نەخۆشی.

**ئاشک (باک.):** چیکڵدانەی مرۆ و هەموو جوورە زیندەوارێکییە. ئاش بەلان (ک) نیشانەی گچکەکردنەوەیە.

**ئاشکار:** بڕوانە: ئاشکرا.

**ئاشکەرا (باک.):** ئاشکرا. ـــ کرن: ئاشکرا کردن.

**ئاشکرا:** دیار، دیارکەوتوو، ئافتاوی، شتیار، ڕوهند، ئاشکار، بەردەز، خووانی، ئەشکەرە، بارەبار، بێ پێچ و پەنا، پەرت، پەیدا. ـــ بوون: دەرکەوتن، ڤێڤرین. ـــ کردن: (هەورا.) ئاشکرکەردەی، دەرخستن، ڤەوڕاندن، پەردە لەسەر لابردن، درکاندن، ڤێڤڕاندن، ڤەپچەڕاندن.

**ئاشکرین:** کڕینی ئاشی.

**ئاشکرایی:** بەرچاوی، شتیاری. بە ـــ: بە بێ پێچ و پەنا و شاردنەوە.

**ئاشگەڕان:** ئیش بە ئاش کردن.

**ئاشگە (کۆ.):** ئاشخانە، چێشتخانە.

**ئاشگەڕێن:** وەستای ئاشی، کەسێکی ئاشی ڕەنێو بێنێ، بە کەسێکیش دەڵێن، کە بتوانێ ئیشی خۆی هەڵسووڕێنی.

**ئاشگێڕ:** ئاشەوان. ئەندازەییێکە لە ئاو، کە ئاشی پێ بگەڕێ.

**ئاشماست:** دۆکوڵیو، دۆخەوا.

**ئاش مناڵگەل:** چێشتە قوڵە. گون نگاوی.

**ئاشنا:** کارئاشنا، کارزان، دوست، ڕوشنا، ئاسیاو، ئاسراو، ئاسیار، دۆس، دۆست، برادەر، شارەزا، ئامناس. ـــ بوون: شارەزا یا دۆست بوون. ـــ کردن: شارەزا یا کردنە دۆست.

**ئاشنانەوە:** ئاش دامەزراندن و خستنە گەڕی.

**ئاشناس:** (باک.) ئاشنا.

**ئاشنا و ڕۆشنا:** ئەو کەسانەیە، کە تێکەڵاوییان لەگەڵ هەبێ.

**ئاشنایانە:** دۆستانە.

**ئاشنایەتی:** دۆستایەتی، برادەرایەتی، ناسیاوی، شناسی، تێکەڵی. شارەزایی، زانیاری، سەر لێ دەرچوون.

**ئاشنایی:** دۆستی، ناسیاری، دەنگ، شارەزایی.

**ئاشۆ (باک.):** پشێوی. (ئەردە.) کێم، هەوا، چڵک. پشێوی، شێواوی.

**ئاشۆو:** چڵک، چڵکن، پیس و پۆخڵ.

**ئاشوەستا:** وەستای ئاشی، وەستای ئانەوەی ئاش.

**ئاشوەستایی:** وەستایەتی ئاشی.

**ئاشووب:** شەڕ و کێشە، هەرا، پشێوی.

**ئاشوب پەشوو (باد.):** خەونی پڕ و پووچ.

**ئاشووبگێڕ:** شەڕ و کێشە و پشێوی هەڵاییسان.

**ئاشووبگێڕان:** شەڕ و کێشەنانەوە.

**ئاشووبنانەوە:** شەڕ و کێشە و پشێوی هەڵاییساندن.

**ئاشووبەشوو:** ووتەی شڕم و بڕم و پڕ و پووچ، هەڵیت و پەڵیت.

**ئاشوت** (باک.): هەرەس. ئەو ڕنووە بەفرەیە، کە لە کێوانەوە دەکەوێتە خوواریێ.

**ئاشووژن** (باک.): بەندروو یا بەنێکە زاری جەواڵی پێ دەدروێت.

**ئاش و ماش:** ووتەیێکە منداڵان کاتێکی بەکاری دەهێنن، کە بڕیار بدەن قسە لەگەڵ یەکتری نەکەن و دەنگ لێکتری ببڕن.

**ئاشهێڕ:** کەسێکە باراشان کۆبکاتەوەو بیبا بۆ ئاشی بۆ هاڕینی.

**ئاشێ:** کووێرەوەری.

**ئاشی** (باک.): کەسێکە باراشی بباتە ئاشی.

**ئاشی ئاوی:** ئاشێکە بە ئاوی بخولێتەوە.

**ئاشی بای:** ئاشێکە بە بای کاربکات.

**ئاشیت:** (باک.) هەرەس، ئەو ڕنووە بەفرەیە، کە لە کێوان دەکەوێتە خووارەوە. بڕوانە: ئاشیتا.

**ئاشیتا:** ئێلەکی گەورەیە لەنێوانی شاری قامیشلوو و (چلاغا) دا. ئەولیا چەلەبی گەڕۆکی ترکی ناودار لەپێش ۸۰۰ ساڵاندا نووسیویە: (ناوی هۆزێکی کوردە لە جزیرە).

**ئاشیتی:** (باک.) ئاسایش، ئاسوودەیی، هێمنی.

**ئاشێڕ:** بڕوانە: ئاشهێڕ.

**ئاشێف:** (نە.، باک.) ئاشەڤ، شێواوی، پەرێشانی. ـــ کرن: هەڵکەندن و شێکردنەوەی بنی سەوزایی و کشتوکاڵ بۆ بە هێز بوونیان، هەڵکەندن، بژاری باخ و باغچە و شیناوەردیان پاچەکۆڵە کردنی.

**ئاشێگە:** (باک.) شووێنی سەختی ڕەق لە زەویدا، کە بۆ کوشتوکاڵ دەست نەدات.

**ئاشین** (باک.): قوونێر، زیپکە، دوومەڵ. ئاهە هەڵکێشان.

**ئاشێو** (باک.): قۆرت، ڕووشە، گێچەڵ. پشێوی، شێواوی، ئاشوو.

**ئاشی وولاخی:** ئاسیاوی ئەسپی.

**ئاشیێڕ:** ئاشهێڕ، کەسێکە بە شووێنی باراشاندا بگەڕێ بۆ هاڕینیان.

**ئاغا:** بڕوانە: ئاخا.

**ئاغابانوو:** بڕوانە: ئاغەبانوو.

**ئاغابانی:** ئاغەبانوو، جامەدانی. ئاغاوبانوو، ئاغا و خانم.

**ئاغاوێ:** گەورە و خاوەندی دێ.

**ئاغازادە:** کوڕ یا کچی ئاغایە.

**ئاغاژن:** ژنی ئاغا، خانمی ئاغا.

**ئاغاوات:** بۆگەلە، ئاغایان.

**ئاغاووک:** ئاوروکێ بێداری. گۆرانی بێژ و شاعەرێکی کوردی باکوورە.

**ئاغایانە:** چەشنی ئاغایان، بەگانە، گەورانە، ئاغایی، وەکوو ئاغایان. چتێکیشە بۆ ئاغایان کۆکرێتەوە، سەرانە.

**ئاغایی:** بڕوانە: ئاغایانە، ڕێ و ڕەووشتی ئاغایان.

**ئاغە:** بڕوانە: ئاغا.

**ئاغەبانوو:** ئاغابانوو، جامەدانی، جامانی، ئاخەبانی.

**ئاغەسووریی:** هۆزێکی کوردە.

**ئاغەڵ:** (سۆ.) قسن، ئاخەڵ، ووشکە کەڵەکی بەگەڕە لە دەورەی گۆڕ و ئێتردا دروستی دەکەن. جێی داکردنی ئاژاڵانە لە زستانێدا.

**ئاغەڵان:** هەوارگە.

**ئاغچی واش:** گیایەکی گوڵ سپیە و بۆنی خۆشە و گوڵاوی لێ دەگرن.

**ئاغری:** پارچەیێکی ناسراوە.

**ئافاقە** (فە.): شادمانی، گوشادی.

**ئافەریدە:** دروستکراو، ئافراندی.

**ئافەرۆز** (باک.): بێ بەش و بێ هرەکردن. (هەورا.) هەڵاتنی مانگ و خۆر و ئەستێرە.

**ئافەرید:** داهێنەر، دروستکار.

**ئافەریدە:** دەستکار، دروست کراو، ئافراندی. ـــ بوون: داهێنران، دروست بوون. ـــ کردن: داهێنان، ڕەخساندن.

**ئافەریدگار:** داهێنەر، خودا، خووا، یەزدان. ـــ ی: خودایی، یەزدانی.

**ئافەرین:** لەکاتی پەسندکردنێدا بەکاردەبرێ. ئوف، تەف، ئوروفت، دەستت خۆشبێ، لەمنت کەوی، دەست خۆش، شاباش، دەمخۆش، تەوتەو، بەهبەه، بەهە، پەح، پەحپەح، دەستت نەڕزێ.

**ئافەرین ئافەرین:** بۆ زۆر پەسند کردنە.

**ئافتابە:** ئافتاوە، مەسینە.

**ئافتاو:** خۆرەتاو، هەتاو. خورشید. خۆر، ڕۆژێکە لە حەوا هەڵدێ هەموو گێتی ڕووناک دەکاتەوە و، کە ئاوابوو گشت گێتی تاریک دەبێ. ئێوی ئافرەتانیشە.

**ئافتاوە:** مەسینە، ئافتابە، خۆشدەر، لوولەهێن.

**ئافتاوولەگەن:** مەسینە و دەستشۆر.

**ئافتاوگەردان:** سەیوان، چەتری هەتاوێ. چادری گچکە، خێوەتی بچووک.

**ئافتاونیشان:** بلوورێکی سپی ئەستوورە وێنەی مەسینەیەکی پێوەیە. مەڕمەڕشای ئافتاونیشان.

**ئافتاوی:** ئاشکرا، دیار، خویا. ـــ بوون: ئاشکرابوون.

**ئافتووش** (باد.): خۆ تێکەڵ کاری کەسێکی تر کردن، خۆ لە خەڵک هەڵتووتاندن.

**ئافر** (زا.، باک.): ئاخوڕ.

**ئافڕ** (زا.): ئاخوڕ.

**ئافراز** (باک.): هەوراز، لای ژووروو.

**ئافراندن** (باک.، یەز.): ئافەریدکردن.

**ئافراندی** (باک.، یەز.): ئافەریدە.

**ئافرەت:** (باک.) ئاڤرادە، پیرەک. ژن، پەت، پەتکۆ، پەتۆ، (هەورا.) ژەنی، بۆ ژن و کچی گەورە بەکاردەبرێ.

**ئافریش:** ئافەریدکرد.

**ئاڤ** (باک.): ئاو. ئاڤدان: ئاودان.

**ئاڤا** (باک.): ئاوا، ئاوەدانی. ـــ بوون: ئاوابوونی ئاوایی. ئاوابوونی مانگ و خۆر.

**ئاڤتەزی** (باک.): ئاوی سارد، ئاوی تەزیو.

**ئاڤا ترش** (باک.): سرکە.

**ئاڤار**: چەرمی ئاژاڵ و ئیتر، کەوڵ.

**ئاڤارەش**: ئاوی رەش. رووبارێکی رەشە لە نصیبینی.

**ئاڤاکەر** (باک.): ئاوەدانکەرەوە.

**ئاڤاکرن** (باک.): ئاوەدان کردنەوە.

**ئاڤانی** (باک.): ئاوەنیا. ئاوەدانی.

**ئاڤاهی**: (باک.) ئاوەدانی، ئاواهی. (باک.) ـــ ی کار: ئاوەدانکار، بەننا.

**ئاڤەرێ**: (باک.) دەربەدەر، لارێ.

**ئاڤەڤەک** (باک.): حەوز.

**ئاڤەهەنگ**: ئاوی بارانە، گۆلێکە، کە باراناوی تێدا کۆبێتەوە.

**ئاڤپیڤاز** (باک.): پیوازاو، شلەی پیواز.

**ئاڤپیواز** (باک.): پێوازاو، شلەی پیواز.

**ئاڤبڕ** (باک.): بەند.

**ئاڤ تێ گەڕیای** (باک.): ئاو تێ گەراو، بۆ بەری دارێک بەکاردەبرێ، کە بێتە سەروکاری گەیشتن.

**ئاڤ تێ وەردان**: ئاو تێ وەردان.

**ئاڤخێز** (باک.): جۆگەلەی خیزدار، ئاوێکیشە لەسەرەخۆ بڕوات.

**ئاڤدا**: (باک.) جوورە دارێکە. هەودا، تاڵ، داو. ئاڤدا ئاڤدا: هەودا هەودا.

**ئاڤدار** (باک.): ئاودار. جوورە دارێکیشە. خۆش و بەتام.

**ئاڤداری**(باک.): ئاوداری.

**ئاڤدان** (باک.): ئاودان.

**ئاڤدانک**: سەتڵ، دەفری ئاو.

**ئاڤدای** (باک.): ئاودراو.

**ئاڤدە**: داو، هەودا، تاڵ.

**ئاڤدەس** (باک.): ئاودەست.

**ئاڤدەست** (باک.): ئاودەست.

**ئاڤدەستخانە** (باک.): ئاودەستخانە.

**ئاڤدەلیک**: ئاڤدەڤ، ئاوی زار.

**ئاڤدرگە**: بڕوانە: ئاودرگە.

**ئاڤدۆنک** (باک.): شۆرباوی بێ تام، شۆرباو، ئاوی میوە و ئیتر.

**ئاڤدەم**: لیک، ئاوی زار.

**ئاڤدێر** (باک.): ئاودێر. ـــ ی: ئاودێری.

**ئاڤدین** (باک.): تۆڵە، سزاساندن.

**ئاڤر** (باک.): ئاوور، ئاگر.

**ئاڤراد** (باک.): ئافرەت، پیرەک.

**ئاڤراز**: هەوراز.

**ئاڤراندەر** (باک.، یەز.): داهێنەر، لە نوێوە هێنەرەدی.

**ئاڤراندن** (باک.، یەز.): داهێنان، لە نوێوە هێنانەدی.

**ئاڤرتن** (باک.): ئاوڕژتن.

**ئاڤ ڕژاندن**: دەستاو ڕژاندن، چوونە سەراوێ.

**ئاڤرمیش** (زا.): ئاوریشم.

**ئاڤرۆ** (باک.): پاشماوەی ئاوێکییە دووای خواردنەوەی لەناو بەرداخیدا دەمێنێتەوە.

**ئاڤروو** (باک.): ئابڕوو.

**ئاڤرووبەر** (باک.): ئابڕووبەر.

**ئاڤڕوودار** (باک.): ئابڕوودار، ئابڕوومەند. (باک.) ـــ ی: ئابڕووداری.

**ئاڤڕوومەند** (باک.): ئابڕوومەند. (باک.) ـــ ی: ئابڕوومەندی.

**ئاڤرێتن**: ئاوڕژتن.

**ئاڤرێژ** (باک.): ئاوڕێژ، ئاوێکە سەر نشێو بێ. سەراو، ئەدەبخانە، ئاودەستخانە.

**ئاڤرێژن** (باک.): ئاوڕێژ، شوێنێکە ئاوی لەسەر ڕانەوەستێ و لێژ بێ.

**ئاڤزەلەک** (باک.): گێلاس. کیسە ئاوێکە لەنێو لەشی پیاریدا پەیدا دەبێ.

**ئاڤزەلێلک** (باک.): نەخۆشی ئاوبەند.

**ئاڤزەمەکی** (زا.): چتێکە یا قسەیێکە درەنگ بگات.

**ئاڤزوونک**: ئاڵقەمزوونە، ئاڵقە و دوگمەی پشتێندێیە.

**ئاڤزێ** (باک.): ئاوەزێ، زناو.

**ئاڤزێڕ** (باک.): ئاوەزێڕ.

**ئاڤزیڤ** (باک.): ئاوەزێو.

**ئاڤزێل** (باک.): حەوز.

**ئاڤزێم** (باک.): بەهارە کانی، کانیاوێکە لە بەهاراندا بتەقێت و لە هاویناندا ووشکی بکات.

**ئاڤزیم** (زا.): کانیەکە، کە هەر لە بەهاراندا بزێتەوە.

**ئاڤزێمک** (باک.): ئاڵقەمزوونە، ئاڵقەی پشتێندێ. مامک، قەوسەلە، لۆتەر، مەتەڵە، هەتەڵ، هەڵهێن. ـــ ی: مامکی، قەوسەلەیی.

**ئاڤزەن** (باک.): مەلەوان.

**ئاڤزەنی**: مەلەوانی.

**ئاڤس** (باک.): ئاووس. زگپڕ، تۆلدار.

**ئاڤسارک**: سارداو، سەرداو بۆ فێنکی و هی ئاوێ.

**ئاڤساندن** (باک.): ئاوساندن.

**ئاڤسیر** (باک.): شۆرباوی سیری.

**ئاڤسیرک** (باک.): شۆرباوی سیری.

**ئاڤسین** (باک.): تێگەیشتن. ئاووسبوون.

**ئاڤشۆ** (باک.): ئاوێکە پاش شووشتنی قاپ و قاچاخان دەمێنێتەوە.

**ئاڤشۆرک** (باک.): خواردنێکە لە ڕۆن و ئاو و خوێ دروست دەکرێ و خواردەمەنی هەژارانە.

**ئاڤشیز** (باک.): جۆگەلەی زیخدار، ئاوێکە لمی تێدابێ.

**ئاشیلە** (باک.): شیلەی ترێ، ئاوی بەرسیلە.

**ئاشکێش** (باک.): ئاوکێش.

**ئاشگۆشت** (باک.): شۆرباوگۆشت، گۆشتاو.

**ئاشگۆن** (باک.): شینێکی سووکە.

**ئاشگیر** (باد.): زناو، زنکاو، زۆنکاو. گۆل، زەوییەکە چاڵ و نشێوبێ و ئاوی باراناوی تێدا کۆ بێتەوە.

**ئاشگینە** (باک.): گۆزە، مەسینەی شووشە.

**ئاشلدانگ** (باک.): مندالّدان.

**ئاشۆر** (باک.): نێریە کێوی.

**ئاشۆک** (باک.): کوولەکە، کودی.

ئاشۆک

**ئاشێ** (هەورا.): ئاو.

**ئاشێ** (باک.): بە پێچەوانەی دێمی، کوشتوکاڵی ئاوی بەراو، ئاوی، تەڕو بارانە. جانەوەر و زیندەوارانی ئاوێ. بێگانە، هەترە، ئاوارە، کە مەرێک بچێتە ناو مەڕی کەسێکی ترەوە دەڵێن ئەڤ پەزە ئاڤییە.

**ئاڤیاری** (باک.): ئاویاری.

**ئاڤێتن** (باک.): ئاوێژتن، فڕێدان.

**ئاڤێژە** (باک.): خاوێن، بێ پەڵە.

**ئاڤێن** (باک.): هەوێن.

**ئاڤێستا**: پەرتووکە پیرۆز و ئاسمانییەکەی زەردەشت پێغەمبەرییە بە ڕاڤەکراویش هەیە پێی دەڵێن: زانداوێستا.

**ئاڤێن**: بڕوانە: ئاڤێن.

**ئاڤینک** (باد.): شەونم، (باد.) خوناڤ.

**ئاقار**: بەرانبەر. سنوور.

**ئاقاق**: دارێکی ناسراوە.

**ئاقد** (باک.): گومبەز.

ئاقد

**ئاقوو**: حاقوو، جوورە کۆترێکە.

**ئاقووبات** (باد.): پارێزگار.

**ئاقووت**: یاقووت.

**ئاقیق**: عەقیق.

**ئاقێلە** (ئاکۆ.): کەرەستەی جووتی.

**ئاقێلە و مەقێلە**: داروباری جووتی.

**ئاک**: قوڵەکراوەوەی ناوی (ئاکۆ)یە. بڕوانە: ئاکۆ.

**ئاکلا**: لە سنووری ژێری کوردستانێ دادەنیشتن.

**ئاکار**: کردار، ڕەفتار.

**ئاکام** (هەورا.): مەرگ، ئەنجام.

**ئاکرێ**: ناوی شارێکی کوردستانە لە هەرێمی کوردستاندا کەوتۆتە ناو بادینانەوە.

**ئاکنجی** (باک.): خەڵک، دانیشتوو، نیشتەجێ، خەڵکی شوێنێکی تایبەتی خۆی.

**ئاکۆ**: هۆزێکی کوردە خاوەندی سێ تیرانە: ١) ئاکۆی بەردەرێ ٥٠ دێ دەبێ ناوچەیان سەرکەپکانە. ٢) ئاکۆی پژدەرێ ١٠ دێ دەبێ ناوچەیان دووگۆمانە. ٣) ئاکۆی ناو دەشتێ ٢٧ دێیە ناوچەیان ئینندزەیە.

**ئاکۆ کێویلە** (بل.): ئاکۆیان.

**ئاکۆیان**: ئەو ئاکۆیانەیە، کە لە نزیکی ڕەواندزێ دادەنیشن. (بل.) ئاکۆ کێویلە.

**ئاگا**: نێوی نێرینانە. ووشیار، ووریا، چاودێر، ها، های، ئاگادار، زیرەڤان، برێڤ: مەن های ژێ بووم: مەن ئاگام لێ بوو. ئاگات لە نیشتمانت بێ: ووریای نیشتمانت بە. بە ـــ: ئاگادار، پارێزەر، پارێزگار. ـــ لێ بوون: چاوەدێربوون. ـــ کردن: ووریاکردنەوە، پێ ناندن، پێ ڕاگەیاندن، دەنگدان. زانا، دانا، لێ زان، حاڵی، هۆشیار، هۆشمەند، هۆشدار. بە ئاگا، بێدار، نەنووستوو. وەئاگای بێنە: بێداری کەوە، وەخەبەری بێنە. باس، خوواس، دەنگ و باس، هەواڵ. ها. ـــ بە: ئەک ئەک، ها، هاها، ئاگات لێ بێ. ئاگە، ئاهگە، ئاخگە، کاتی تەنگانە و سەخڵەتی.

**ئاگادار**: بە ئاگا، ووشیار، زیرەڤان، پارێزەر، پارێزگار، برێڤ، پارێزدار، حاڵی. بێدار. ـــ بوون: بێداربوون، ئاگاداری دەستخستن، برێڤان. ـــ کردن: وەئاگا هێنان، بێدارکردن. ـــ کردنەوە: لە خەو هەڵستاندن، ووشیارکردنەوە.

**ئاگاداری**: ووریایی، چاوەدێری، بە هۆشی، شارەزایی. بێداری. ـــ کردن: پێڕاگەیاندن، وەلاّم دان.

**ئاگادەر**: وەلاّمدەر، پێڕاگەیێن، دەنگ و باس ڕاگەیێن.

**ئاگاکردن**: وەئاگا هێنان، دانەزان، ووشیار کردنەوە، ڕاگەیاندن.

**ئاگال** (باک.): حەگال، جامەدانی و پەتێکی بادراوی ڕەشە ئارەوان لەسەری دەنێن.

**ئاگاهی** (باک.): بۆ ئاگاداری، ئاگایی.

**ئاگایی**: ئاگاداری، سەلیقە، سەرپەرشتیی.

**ئاگە** (ئـەردە.): ئاهگە، ئاخگە، کاتی تەنگانە و سەخڵەتی نەخۆش، ئۆگە، (هەورا.) چاگە، ئەوێ.

**ئاگر**: ئاوور، ئاتر، ئاڤر، ئازەر، ئاهێر؛ تەندوور و کوورە بە ئاگر گەرم دەکرێ. ـــ دان: چەک تەقاندن، ئاووردان. ـــ کردنەوە: بناغەی کێچەڵ و ئاژاوەنانەوە. ـــ لە گیان بەربوون: ئالۆز و توند بوون، تووڕە. ئاگر لە زاری دەبارێ: بە تووڕەیی و جنێوەوە دەدوێ. ئاگری گرتووە: ڕقی هەستاوە، تووڕە بووە.

ئاگر

**ئاگرە**: ئاتەشەک، ئاوورە، ئاگرۆکە، ئاگرەکە، هەرڵەفەرەنگی، جوورە برینێکە بە دەم و چاوی منداڵان هەڵدەپەڕێ. جوورە یارییەکی دوو دەستەییە. جوورە نەخۆشییەکە لە کشتوکاڵان دەدا گەڵایەکانی زەرد و ووشک دەکات و لە ناوی دەبا.

**ئاگرەکە** (دەر.): شەرا، گرەیێکە بدات لە مەرمزە و لەناوی ببات.

**ئاگرەگیرە**: دەستەچیلە، قولەچیلکە و پووش و پەڵاشێکی ووشکە بۆ ئەوەی بە ئاووری دایگیرسێنن و لە شووێنێکەوە ئاگری بۆ جێگایەکی تر پێ بگوێزنەوە.

**ئاگربارانە**: ئاووربارانە، مەبەس لە پشێوی و ئاژاوەی ڕۆژگارە.

**ئاگربارانـدن**: ئاووربارانـدن، گوللە بارانکردن.

**ئاگرباز** (باک.): ئاوورباز، گەمەکار بە ئاووری. ـــ ی: (باک.) ئاووربازی، یاری بە ئاوور کردن.

**ئاگر بەربوونەوە:** پەیدابوونی ئاگر لە شوێنێکیدا.

**ئاگربڕ:** بەرهەڵست کردنی ئاگر بۆ ئەوەی، کە نەتەنێتەوە. بە چەشنێکی وا ئاخۆتن، کە چتی خراپ لە خۆ دوورخستنەوە.

**ئاگر بەردانەوە:** ئاگرنان بە شوێنێکەوە تابیسووتێنی.

**ئاگر پارە:** مەردومی زرنگ و زیرەک. منداڵی بزۆز و شەڕفرۆش و شەیتان.

**ئاگر پارێز:** ئاگر پەرست. ـــ ی: ئاگر پەرستی.

**ئاگر پەرست:** ئاگر پارێز. ـــ ی: ئاگر پارێزی.

**ئاگر تێ بەربوون:** سووتان، ئاوورگرتن. ڕق هەستان، بە پشم و کین بوون.

**ئاگرخان:** ئارتوون، ئەتوون. جەهەننەم.

**ئاگرخووەش** (باک.): میهرەبان، میوان نەواز، زمان شیرین، ڕووخۆش، گاڵتەچی.

**ئاگردادان:** (باک.) ئاگرداران، بەدخوویی، داوێن پیسی.

**ئاگردار:** ئاووردار.

**ئاگردان:** قووڵکەیەکە ئاگری تێدا دەکرێتەوە، گۆڕک، ئاوورگ. ئاووردان و تەقاندنی چەک. دەرکردن. کوچکی ئاوور.

**ئاگردانک** (باک.): ئاووردان، ئاوورگ.

**ئاگردەمێن:** کوورەی ئاگر گەشکردنەوە. ئەو کەسەیە کوورەی بدەمێنێ.

**ئاگر دوو** (باک.): ئاوور دوو.

**ئاگر ڤەمر** (باد.): ئاوورکووژێنەوە.

**ئاگرڤێخ:** (هەورا.) ئاژووەر، شۆفێر.

**ئاگرڤێخستن** (باک.): ئاگردووبارەکردنەوە.

**ئاگرڤەکوژتن** (باک.): ئاوورکووژاندنەوە.

**ئاگرڤەمرندن** (باک.): ئاوورکووژاندنەوە.

ئاگرکوژ

**ئاگر کەوتنەوە:** ئاگر بەربوونەوە، ئاوور تێ بەربوون.

**ئاگرکردنەوە:** ئاوور کردنەوە، ئاوور هەڵاییساندن، ئاگر خۆشکردن. بنچینەی شەڕ و کێشەنانەوە.

**ئاگرکوژ:** ئاگرکووژێنەوە.

**ئاگرکووژێنەوە:** ئاوور کووژێنەوە، شەڕ و گێچەڵ دامرکێنەوە.

**ئاگرکێش:** (دەر.) کووانی کێش، (هەورا.) مەسێ، خاکەنازی ئاگر کێشەوە.

**ئاگرگەرم:** ڕشتبوون لەسەر کارێک، سووربوون لەسەر کارێک. بۆ ژن یا پیاوێکی هەوەس پەرستیش بەکاردەبرێ.

**ئاگر گەش کەرە:** بڕوانە: ئاگر گەش کەرەوە.

**ئاگر گەشەوکەر** (ئەردە.): ئاگر گەش کەرەوە.

**ئاگر گەش کەرەوە:** (باد.): ئاوڵەمە، چتێکە بەقەد نیمچە بەرداخێکی لە تێل دەچنرێ و زریزەییێکی درێژی پێوەیە ڕەژۆ و ئاگری تێدەخرێ بە هەڵسووڕاندنی گەشی دەکاتەوە.

**ئاگرگر:** ئاگر گرتوو، ئاوور گرتوو. ژن یا پیاوێکی هەوەس پەرستە.

**ئاگرگرتن:** ئاوورگرتن، تووڕەبوون و داگیرسانی ئاوور، (باک.) ئاگر گوڕکرن، ئاگر گەش کردنەوە.

**ئاگر گرووشک:** ئێسقانی چەناگەیە.

**ئاگرگرە:** دەس ئاگر، چاوکە، دەستە چیلە.

**ئاگرناک:** بقە، مەردومی تووڕە و تڕۆ.

**ئاگرنانەوە:** ئاگر بەردانەوە.

**ئاگرۆچکە:** ئاورە، ئاگری بچووک و کز. ئاگرۆچکەی منداڵان، گەمەیەکە.

**ئاگرۆشکە:** ئاورە، ئاگرۆکەی منداڵان.

**ئاگرۆک:** مەردومی دووزمانی ئاشووبگێڕ. شەرایەکە لە مەرەزە دەدا.

**ئاگرۆکانێ:** (هەورا.) ئاورۆچکەی منداڵان.

**ئاگرۆکە:** جووره برینێکی ئاوداری منداڵانە لە ڕوو پەیدا دەبێ، (هەورا.) ئاووره، ئایزەقوڵە، واز. ئاگرۆشکەی منداڵان.

**ئاگری** (فە.): ژن یا پیاوێکی هەوەس پەرستە. ناوی چیایەکی گەورە و ناودارە کەوتۆتە کوردستان و نزیک سنووری ئێران و ڕووسیا دیارە ئاگری لێ بووە، ئاراراتیشی پێ دەڵێن.

**ئاگری ژێرکا:** بۆیەکێک بەکاردەبرێ، کە لە ژێرەوە بە نهێنی شەڕ و گێچەڵ هەڵاییسێنی.

**ئاگرین** (باک.): ئاورین، چتێکە وەک ئاگر. مرۆیەکە زۆر ئازا و بەکار بێت.

**ئاگینجە** (باد.): پۆلیس.

**ئال** (باک.): ئالاّ. ئاڵ، ڕەنگی سوورێکی کاڵ، سوورێکی سووک و کراوەوەیە. لا، کن، ڕەخ، ڕۆخ. لە ووشەی (ئالان) قوڵەکراوەتەوە لەنێو لزگەی سەرچاوەکانی ئەم فەرهەنگەدا. پەنجەی بالاّبەرزە ی دەست.

**ئاڵ:** ئال، پەنبەیی، ڕەنگی سوورێکی کاڵە لە ئاوی قۆرە و ڕۆنیاسی دروست دەکرێ. (مەن.) هەژار، نابووت. جووره نەخۆشییێکە تووشی هەندێ کەس دەبێت لە باری زەییستانیدا و دەیکوژێ، شەوە. بارێکە تووشی ددانی مرۆڤان دێت لە کاتێکیدا، کە چتی ترشی وەکوو قۆرە و ئیتر بخووات. کە بڵێن ددانم ئاڵ بۆتەوە واتا خاو و نەرم و نەبڕ بووە، (هەورا.) هاڵ.

**ئالا:** ناوی شارێکی کوردان بووە لە کوردستانی گەرمێنیدا بەڵاّن ئێستا کاوول بووە وەکوو دەڵێن: مەمێ ئالا.

**ئالاّ:** بەیداغ. (هەورا.) ئالاّیی، (باک.) بەندێر، بەیرەق، بێراق، (باک.) ئالە. درەوش. تیپێک پێشمەرگە، کە (٤٠٠) کەس بێ. قەڵەمی نووسین.

ئالاّ

**ئالاڤ** (باک.): مراز، ئامراز.

**ئالاّی چکۆڵە:** سهرک، سهرە.

**ئالانی:** ڕەنگین، زەرد و سوور.

**ئالاّت** (کۆ.): بیبار.

**ئالاّدار:** درەوشدار، ئالاّهەڵگر، ئالدار.

**ئالاّداری:** ئالاّ هەڵگری.

**ئالاّستن:** لستنەوە، وەکوو مانگا گوێلکی خۆی بلیسێتەوە.

جێگـای بـاداری بـنری دەیکاتـە بلـۆق و ئـاوێکی زۆری لـێ دێ و چـاکی دەکاتەوە.

**ئالێک** (باک.): لایەک، لایێک، کەنارێک.

**ئالێک**: مووچـەکاو جۆیەکـە کـە بدرێ بـە وولاخ و ئـاژالان، خواردەمـەنی وولاخانـە، جەمـە جۆیەکـە. ـــ ووشک کردنـەوە: چلمسـاندن. ـــ ووشـک بـوون: چلمسـین، ئـالـک، دێـزی. ـــ دان: دانـدان، ئـالیکی ووشـک: چلمسی.

**ئالیکار** (باک.): یاریکار. ـــ ی: یاریکاری.

**ئالێکۆک** (بابا.): ئاڵەکۆک.

**ئالیگووشک** (باک.): دەنگ گڕی گەرووە، شەویلکە.

**ئاڵیگۆڵینگ** (موک.): بڕوانە: ئاڵیقوڵینگ.

**ئالین** (باک.): ئالان، پێچران.

**ئالیندار** (باک.): ئاڵوودار، ئەودارانەیە، کە دەکەونە سەر کاریتە.

**ئاڵینگ** (کۆ.): ئاڵووی جێگای بریندار، دارێکی باریکی تووڵـەدارە لـە دەم ئاوان شین دەبێ بەری وەکوو شاخی مامزی جووت دەگرێ و ناخورێ و گەلاّیەکانیشی وە هی پرتەقاڵی دەچێ.

**ئاڵینۆک** (سوور.، هەو.): لەپە، لەتکەنۆک.

**ئام** (باک.) مام.

**ئاما** (هەورا.): هات بۆ ڕابردووی نزیکە.

**ئامادە**: ڕێک و پێک، درووست، ساز، چک، دەرباز، دەردەست، پوخت، پەرداخ، بەردەست، بندەست، تەدارەک، (باک.) ئەیڤەز، گەلاڵـە، تـەیار، کەمەربەستە، قومراخ. گەچی گیراوەوەی نەکوژراوی بەهێز. ـــ بوون: ئەیڤەزین، پەرداخ بوون، (باک.) دروستیا خۆکرن، وەخۆکەوتن، هلسـتن، سازبوون.

**ئامادەکەر**: سازکار، تەدارەککار، وەخۆخەر، قومراخکەر.

**ئامادەکەردەی** (هەورا.): ئامادەکردن.

**ئامادەکردن**: سازکردن، ئەیڤەزاندن، پەرداخ کردن، تەیار کردن، سازدان، وەخۆ خستن، هلستاندن.

**ئامادەکریاگ**: سازکراو، پەرداخ کراو.

**ئامادەیی**: سازی، زیچ، ڕێک و پێکی چت.

**ئاماژ**: نیشانە، ئامانج.

**ئاماس**: ئاوساوی.

**ئاماسان** (جا.): هەڵمسان، هەلاّمسان، ئاووسان، پەنمان.

**ئاماسیان**: هەلاّمسان، هەڵمسان، ئاووسان، پەنمان.

**ئاماسیاو**: پەنماو، هەلاّمساو، ئاووساو.

**ئامان**: قـاپ و قاچاخ، جام، (دەر.) هیربار، ترگال، ترگار، ئاسن جاو، دەفر، سینیک کـە مـس بن، لـە کاتی هاوار و بـانگی خـەم و پـەرۆش و لێقەومانێدا بە دەنگی بڵند بەکاردەبرێ، بەواتا: پـەنا، هانا، لالـە. نێوی ئافرەتانە. (هەورا.) هاتووە بۆ ڕابردووی دووری نادیار.

**ئامان ئامان**: لە تەنگانە و خەفەتێدا بەکاردەبرێ، دووپاتە کرانەوەکەش بۆ جەختە.

**ئامانەوە** (هەورا.): هاتنەوە.

**ئامانج**: (باک.) ئارمانج، سەرک، نچک، نیشانە، مەبەس، دڵخواز بۆ پێکانی خزم و خوێش.

**ئامانگورێ** (هەورا.): جوورە مەقامێکە.

**ئامان و شیان** (هەورا.): هاتن و چوون، هاتوچۆکردن.

**ئاماوە چووەر** (هەورا.): چوونەژوور، وەژوورکەوتن.

**ئاماو ئەوو** (هەورا.): ئاورداهاتن.

**ئاماولووای** (هەورا.): هاتن و چوون.

**ئامای** (هەورا.): هاتن.

**ئامای بەر** (هەورا.): هاتنەدەر.

**ئامایە** (هەورا.): هاتووە بۆ یەکێکی بزری مێیە.

**ئامایی**: کوێری.

**ئامە**: لە ئامان کورتکراوەتەوە و لە ئامان اللە. (ئەردە.) دایک، داک.

**ئامەد** (ئەردە.): بەخت، ساڵی هات.

**ئامە شۆ** (هەورا.): هاموشۆ، هاتووچۆ.

**ئامبایی**: هاواڵ، برادەر، هاوڕێ.

**ئامباز**: ئاوڕێش، تووش. ـــ بوون: ئاوڕێشی کەسێکی بوون، دەست لەناو قەدی وەرێنان بۆ کێشەو شەڕ.

**ئامبازە**: بڕوانە: ئامباز.

**ئامبایی**: هاواڵی، برادەرایەتی.

**ئامتا**: هاوتا، هاوشان.

**ئامتایی**: هاوتایی، هاوشانی.

**ئامراز**: مـراز، کەرەسـتە، یەکێکـە لـە پارچـەکانی کەرەسـتەی جووتـی و دارتاشی و ئیتر.

**ئامڕاز**: هاوڕاز، هاوبیر و باوەڕ.

**ئامڕازی**: هاوڕازی، هاو بیر و باوەڕی.

**ئامڕێیی**: هاوڕێیی، هاوالاّیەتی.

**ئامسا**: هاوسێ، دەراوسێ.

**ئامسایی**: هاوسێیەتی، دەراوسێیەتی.

**ئامسەر**: هاوسەر.

**ئامسەری**: هاوسەری.

**ئامشۆ**: هاتووچۆ، هاموشۆ.

**ئامشۆکەر**: هاتووچۆکار.

**ئامشۆکردن**: هاتووچۆکردن.

**ئامک**: پووڕێکی کە خوشکی باووک بێ.

**ئاملکان** (فە.): داماڵران بۆ پێست.

**ئاملکنن** (فە.): داماڵین بۆ پێستە.

**ئامۆ**: هەوجاڕ، هێش.

**ئاموودا**: شـارێکی گچکـەی کوردانـە کەوتۆتـە لای ڕۆژاوای شـاری قامیشلی، نیشتیمانپەروەری باشی زۆر لێ هەڵکەوتووە.

**ئاموودی** (باک.): هەڵپەڕین، دیلانە، جوورە هەڵپەڕینێکە.

**ئاموور:** (هەو.) هەوجاڕ، نێڵەقە، (باک.) ئەمبوور، دەستەمەستە، گاسن، دەندە، سەرمژانکە و هەوجاڕ، چەند پارچە مرازێکە لە ناو کەرستەی جووتیدا وەکوو: دەستە مستە، گاسن، دەندە، سەرمژانکە، هەوجاڕ.

**ئامۆزا:** پسمام، (باک.) پزمام، هاپۆزا، مامۆزا، کوڕ یا کچی مام، کوراپ، دۆتام.

**ئامۆزازا:** کوڕ یا کچی ئامۆزایە، منداڵی منداڵی مام.

**ئامۆژ:** دڵدەرەوە، بەخێوکەرەوە، پەنددادەر، ئامۆژگاری، پەند.

**ئامۆژاری:** ئامۆژگاری، پەند.

**ئامۆژگا:** فێرگە، پەندگە.

**ئامۆژگار:** رامشگەر، مۆژیار، بەرەڤک، پەنددادەر، ئامۆژیار، مۆچیار، ئامۆژار.

**ئامۆژگاری:** پەنددادان، بەسەر یەکێکدا هاتن و رێی باش نیشاندان، شیرەت، پەند، داباش، ئامۆژکاری، ئامۆژیاری، مۆچیاری، گوور، مۆژیاری، ئامۆژی، بەخێوکردن، لاواندنەوە، ، بەسەر رێشتن، بەسەر داهاتن. رێی باش نیشاندان.

**ئامۆژگاری کردن:** مۆچیاری کردن، لاواندنەوە.

**ئامۆژن:** ژنمام، مامۆژن، ژنی مام، هاپۆژن، ئاپۆژن.

**ئامۆژیار:** ئامۆژگار.

**ئامۆژیاری:** ئامۆژگاری، مۆژیاری، مۆچیاری، مۆچ.

**ئامووشۆ:** هامووشۆ، هاتوچۆ، تێکەڵاوی.

**ئامێ** (هەورا.): هاتن، هەوێنی ماست و پەنیر و نیتر: بۆ دووکەسانە، (ئەردە.) لە ئامان الله کورتکراوەتەوە.

**ئامیان** (هەو.): هەوێنی ماست و پەنیرە و نیتر، ئامێژەن، فریشک.

**ئامێتە** (هەورا.، هەم.، جا.): تێکەڵاوە. ـــ بوون: تێکەڵاو بوون. ـــ کردن: تێکەڵاو کردن.

**ئامێد:** بڕوانە: ئامێدی.

**ئامێدی:** شارێکی کوردانە لە بادینانەدا کەوتۆتە ژووررووی موسڵێ، کە دەڵێن ناوی عمادیەیە و درۆ و هەڵەیە چونکوو لە بنچینەدا لە مادو میدیا وەرگیراوە.

**ئامێژن** (ئەردە.): هەوێنی پەنیروماست.

**ئامێژەن:** تێکەڵکردنی کەمێک لە چتی باش لە گەڵ چتێکی تر بۆ باشکردنی وەکوو دەڵێن ئەم ئاردە جۆیە ئامێژەنێک ئاردی گەنمی لێ بدە، فریشک، هەوێنی پەنیری، ئامیان.

**ئامێز:** هەمبێز، باوەش، هەمبیز، (هەورا.) واوشە، تەلیک، هامێز. ـــ تێ وەر هێنا: لە باوەش گرتن. لە ـــ کردن: هەمبیزکردن.

**ئامێنێ** (هەورا.): هاتن بۆ گەلی نێرینەو مێینانە. هاتوون.

**ئان** (بار.): دەنا، (باک.) یا، یان، (موک.) ئامرازی گەلە، ییَت، یێن، نینە وەکو دار بۆ گەل داران، کار: کاران، شار: شاران. ئان (ئەردە.) دەم، کات، رۆژگار. ناز، ئەدا، شیرینی، نازداری.

**ئاناشتایی:** لەخوڕێتی، بە ئاشتایی مانەوە لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆیە.

**ئانام** (ئەردە.): ئەندام.

**ئانە** (هەورامی کۆن.): مـن، ئـەمن، ئـەز. (ژاوە.، هەورا.) هۆوە، ئەوە(بۆ دوورە)، (عیراق) چوار فلسە. ئامرازی رێچواندنە بە دووای ناوانەوە دەنووسێ، وەکوو: شێرانە واتە وەک شێران، پیاوانە، واتا وەک پیاوان. ئامرازی دانە پاڵپشتە وەکوو مانگانە، رۆژانە، دووانە، شەوانە، یێکانە.

**ئانەت:** (باک.) تۆ و بەری ئەنیسۆنە.

**ئانەشا:** ئەوەیان.

**ئانەنە** (هەورا.): هۆوەتا، هۆوەتانێ: بۆ زۆر دوورترین.

**ئانەهێ** (باد.): دەستوور، وودم، رێدان، وورمێ.

**ئانتەب:** ناوی شارێکی کوردستانە کەوتۆتە لای رۆژاوای کلسێ (عەینتاب)یشی پێ دەڵێن.

**ئانتی تۆرۆس:** ناوێکی کۆنینەی خاکی هەکارییە.

**ئاند** (باک.): ئامرازێکی کرداری تێپەڕە، وەکوو منی هەژاند، من هەژاند.

**ئانقەس:** بڕوانە: بە قەستی.

**ئانکوو** (جز. بۆتا.): یا، یان، ئان، واتا، یانی.

**ئانک** (باک.): چت.

**ئانگۆ** (باک.): یانی، دەنا، نیتر، نیدی.

**ئانگۆر** (باک.): هاوا ڵ، هاوشان، هەمبەر، هاوڕێ.

**ئان و نوون:** نازونووز، نازو نیمناز، نازوغەک، شیرینی، دڵبەری.

**ئان ونین:** نازو نیمناز، نازوغەک، شیرینی، نازونووز، دڵبەری.

**ئانها** (باک.): ئەو دەمی، لە سەرەخۆ دەڵێن: ـــ وەرە: ئەودەمی وەرە، لەسەرەخۆ وەرە، سووک وەرە.

**ئانێ** (هەورا.): بۆ گەلی نزیکە: ئەمانە.

**ئانی:** (باد.) نێوچاوان، (باک.) ئیدی، دەنا، ئەدی، (هەورا.) ئەمە: بۆ یەکێکی مێیینەو نزیکە.

**ئانیسک** (ئەردە.): ئانیشک.

**ئانیسۆن:** گوڵ وەیا بەری ئەنیسۆنە.

**ئانیشا** (هەورا.): ئەوان.

**ئانیشک** (موک.): (فە.) بەلەچەق، قوونانیسک، قینگانیسک، قوونەنیشک، (هەورا.) هەرمژنی، بلەمرک، (خانە.) بەلەمرک، (دزە.) هەنیشک، (باک.، باد.) ئەنیزک، جومگەیەکە لە نێوانی باسک و قۆڵدا.

**ئانیشکە** (موک.): پەردەی پێشدەرگانەی حەوشەیە جا لە چوارچێوە گیرابێ یا نا لەکاتی پێویستدا دادەنرێ و لادەبرێ و یا هەڵدەدرێتەوە و دادەدرێتەوە. دارێکی دوو پەلە بە خوارنکەوە دەبەسترێ پێی ئاشی بە ناودا دەڕوات، بە بەرز و نزمکردنەوەی پێیەکە ئەویش بەرزونزم دەبێتەوە، لوولەو گونجی کەوانەدار کە بۆ سەر سووچ بەکار دێنرێ.

**ئانیلە** (زەن.): ئەوان.

**ئانین** (باک.): هێنان، ئینان، بەرهێنان. ـــ جێ: بەجێ هێنان. ـــ هەڤ: ڕێکهێنان.

**ئاو:** (باک.) ئاڤ، (هەورا.) ئاویی، یاو. ئاوبڕان: چکان، چک بوون، چکیان. ـــ خووار: هێنانە خووار. ـــ دان: ئاڤدان. ـــ دار: بەئاو، تەڕ، پاراو. ـــ ڤە: هێنانەوە. لە ناوی (ئاوێستا) کورتکراوەتەوە بۆ لزگەی سەرچاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە. ـــ ی ڕاوەستاو: کاماڤ، ئاڤاکەر. ـــ وهەوا: ئاڤ و هەوا، ئاوی ڕوو: ئابڕوو، ئاوی جووانی و مەردایەتی، ئاوی سارد: چەییک، چیاو، چیو، ڕچیاو، ئاوی تەزیو، ئاوی سوویر: شۆڕاو، ئاوی گەرم، ئاوی شیلەوگەرم: ئاوی شیرەتێن، بە ئاو: ئاودار، بوونە ئاو: شەرمەزار بوون. تۆوی گیانداری نێرینەو مێینە، مەنی. ـــ ی تری و هەنارو نیتر: شیرە، شیلە. بەڵێ، ئا، ئاریّ، ئەریّ.

**ئاوا:** ئاوان، ئاوەدان، ماڵتان ئاوا: واتە ماڵتان ئاوەدان بێ، ئەوها، بەوجوورە، وەتۆ، وەسان، ئەئاوا، وەرگە، بەوچەشنە، وەک ئەوەی، وا، وەک هۆوەی، ئەوەهە، وەها، وەنی، وەسا، هۆتۆ، ولۆ، هۆسا، چوونەو، بەوشێوەیە، بەوڕەنگە. بزر، گوم، لەبەرچاوان وون، نیشتگ: کابرا لەو گردەی ئاوا بوو: پێیدا تێپەڕی و لەبەرچاوان بزر بوو، مانگ و ڕۆژ لەو کەلووەی ئاوابوون: لە کەلووەی تێپەڕین و بزربوون، ئاڤابوون، پەنایانگرت. ـــ کردن: لەبەر چاوان بزرکردن.

**ئاوابوون:** نەدیو و بزربوونی گیان لەبەر و مانگ و ڕۆژ، ئاڤابوون.

**ئاوابیەوڕۆجیاری** (هەورا.): ئاوابوونی خۆر.

**ئاوات:** هەوا، گام، نیاز، دڵخوواز، داخوواز، ئارەزوو، هیوا، هێڤی، (زەن.) ئاوەخت. ـــ ی دڵ: چتێکە کە هیواداری بکرێ: دارا بە ئاواتی خۆی گەیشت.

**ئاواتە خوواز:** ئاواتواز، هیوادار، ئارەزوومەند.

**ئاواتخووازتن:** هیوا و ئومێدکردن.

**ئاوات واز** (هەورا.): ئاواتەخوواز.

**ئاواتی:** کەسێکە، کە زۆر بە ئاواتی چتێکەوە بێ، منداڵێکە، کە ئاواتە خووازی باوک و دایکی بێ.

**ئاوار** (باک.): هەڵوا لە دۆشاو و ئاردی زۆر توندە ووشک دەکرێتەوە بۆ زستانێ هەڵدەگیرێ، (ئەردە.) ئاودار. تەنبەڵ، سست.

**ئاوارە:** هەرزەگەڕ، چەرخچی، سڕگوم، ڕەهندە، ئەوارە، دەربەدەر، هەڵوەدا، هەڵەتە، ئەوداڵ، هەترە، هەتڵە، ڕیتاڵ، هەرزەگەرد، تارومار، ڕاتوول، گەڕانۆ، سەرگەردان، لێ قەوماو، ئاپۆرە، وێڵ، گاڤ قەلیش، ئاقەڕێ، ئاوەکی، هێوەلەک، گومڕا، تەرە، توونا. ویلان. نێوی نێرینانە. جەوهەر و ڕەواقی چتی. (باد.) بە پەڵوویەکی کەمێک شل و تەڕ دەڵێن، کە لە ئاردوڕۆن دەکرێ. ـــ بوون: هەڵە بوون، هەڵوەدابوون. ـــ کردن: سەرگەردانکردن، دەربەدەرکردن.

**ئاوارەیی:** دەربەدەری، هەڵوەدایی، هەرزەگەردی، سەرگەردانی.

**ئاوارتە:** چتی دەربڕاو، هەڵاوێردراو.

**ئاوارتن** (باک.): هەڵاواردن، جووایەزکردنەوە.

**ئاوارخانە:** شوێنێکە، کە چایچی ناوماڵ چاو و قاوەی تیا لێ ئەنێ.

**ئاواری:** کەرەستەی قاوە و چایە. کابەبار، لە شوێنێکەوە ببرێ بۆ شوێنێکی تر.

**ئاواز:** هۆرە، دەنگ، گۆرانی، دەنگی خۆش و بەرز. نەزم، نزمی مۆسیقا، نەوا. نێوی ئافرەتانە.

**ئاوازە:** چریکە، کازکازە، دەنگی خۆش، دەنگی خۆشی دەنگخۆشانە. دەنگ و باس: ـ ییێک داکەوتووە کە لەمەولا تەنها دەبێ زمانی کوردی بخووێنرێ. ناوو ناوبانگ.

**ئاوازەخووان:** دەنگخۆش، ئاوازە خووێن.

**ئاوازەخووانی:** دەنگخۆشی، ئاوازە خووێنی.

**ئاوازەخووێن:** ئاوازەخووان، دەنگخۆش. ـــ ی: ئاوازەخووانی، دەنگخۆشی.

**ئاوازکردن:** بانگ کردن بە بەرزی.

**ئاوازنگ:** زراو، ئاوازنگ بووە واتا دەنگی زراو و باریک بووە.

**ئاوازی بولبول:** دەنگی بولبول.

**ئاوازی مەل:** دەنگی باڵندە و پەلەوەران.

**ئاواق** (ئەردە.): کەسێکە چاوی لە مۆلەق وەستا بێ، یا ئەبلەق بووبێ، چۆل و هۆل، بەتاڵ.

**ئاوا کردنەوە:** خانووبەرە دروستکردنەوە لە دێیەکی وێران و مرۆی تێدا ڕۆنان.

**ئاواڵ** (موک.): گیایەکە. برادەر، هاوڕێ. (باک.) براک، هاوزێ، ئاوزێ، هاوتەمەن، هاواڵ، برادەر، دەستە برا، (باک.) هەواڵ، ئاوەڵ، هاوەڵ، (بابا.) هاوڕێ.

**ئاواڵانە:** برادەرانە، هاوڕێیانە.

**ئاواڵایەتی:** برادەرایەتی، هاواڵایەتی، دەستەبرایەتی.

**ئاواڵدان:** منداڵدان، پزدان، پسدان، ئاڤڵدانک.

**ئاواڵزاوا:** (دەر.) هامزاوا، هاوزاوا، هەڤا لزاڤا، هەڤلنک.

**ئاواڵکراس:** ئاوەڵکراس، (دەر.) ئاوەڵدامان، هەڤاڵکراس، (باک.) سەرکاپ، لە ڕووی شێوازەوە لەجیاتی دەرپێی ئافرەت بەکار دەبرێ.

ئاواڵکراس

**ئاواڵمنداڵ:** هاواڵ منداڵ.

**ئاو ئامایەنە دلی چەما** (هەورا.): ئاو داهاتنی چاو.

**ئاوان:** (باک.) تەپڕەش، نهێنبڕ (بۆ مرۆڤ)، نهێن گیر، یانی گر (بۆ سەگ)، بێ بەخت، بەدغەک، ناپاک. (هەورا.) هاوونک، ئاوونک، ئاوون، چتی درشتی تێدا دەکوترێ و دەهاڕرێ. ئاوا، ئاوەدان.

**ئاوانە:** مزاش. کرێی ئاو.

**ئاوانتە:** هەوانتە، بەفیڕۆ، بەخۆڕایی.

**ئاوانتەچی:** هەوانتەچی، کەسێکە چتی مەردوم بخوا یا بیبا بە فیڕۆ و بە خۆڕایی.

**ئاوانی** (باک.): تەپڕەشی، ناپاکی، بێ بەختی، بەدغەکی. ئاوەدانی، ئاوایی.

**ئاوئاوانێ:** جوورە گەمەیێکی منداڵانەیە کوڕ و کچ پێکەوە شەڕە ئاوێ دەکەن.

**ئاوبۆک** (باک.): تیزەجاڕ، تیزە زارۆک، شایانی قەشمەری، قەهی، قسە زۆرکەری چەنە درێژ.

**ئاواوی:** تێکەڵ بە ئاو، تەڕ.

**ئاوایی:** ئاوەدانی، دێ، لادێ، دەگا، گوند، شار. ماڵ ئاوایی: ماڵاوایی لە کاتی ڕۆیشتنێدا بەکاردەبرێ، کە بڵێ ماڵاوا لە وەڵامدا پێی دەڵێن بەخێرچی، (باک.) بەوچەشنە، بەوجۆرە.

**ئاوەجۆڕ:** جۆڕانەوەی ئاو لە چتێکی تەڕدا، ئاوچۆڕبوون، واتا ئەمانی چۆڕەی ئاوە.

**ئاوەخان (موک.):** میزدان، تەنەکەیەکی گچکەیە بۆ میز، بەبن لوولەی بلوێری لانکانەوە هەڵدەواسرێ.

**ئاوەرخت (زەن.):** ئاوات.

**ئاوەخۆرە:** سوورێنچک، ڕاوی سەرکانی، ئەو ئاوەیە کە لە لمبۆزی وولاخ دەتکێتە ناو ئاوەوە لەکاتی ئاوخواردنەوەدا. کەلۆرێکە لە نێوەڕاستی داراندا ئاوی پێدا دەخواتەوە. تاس، کاسە، بادە، بادی، قاپ، بەرداخ، پیاڵە یا قاپی ئاو خواردنەوەی، (بار.) ترکاڵ، (باک.) پینەف، خوارروفک.

**ئاوەدان:** ئاوا، ئاڤا، جێگایەکە کە چۆڵ نەبێ. ــ بوون: ئاڤابوون. ــ کردن: ئاڤاکرن. نا ــ: چۆڵ، چۆڵ و هۆڵ.

**ئاوەدانکەر:** ئاڤاکەر، ئاواکار.

**ئاوەدانی:** ئاوایی، ئاڤاهی، ئاڤانی.

**ئاوەدز:** ئاودز، تەشەنە. ــ بوون: تەشەنە بوون. ــ کردن: تەشەنەدارکردن. ــ ی: تەشەنەیی.

**ئاوەڕ(هەورا.):** بڕوانە: ئاوەڕە.

**ئاوەر:** (موک.) هۆش، ژیری، باوەڕ، دڵنیایی، (هەورا.) ئاخوڕ.

**ئاوەرە:** داوەرە، ساوەرە.

**ئاوەڕە (هەورا.):** ئاوەڕ، ئاخوڕ.

**ئاوەڕەش هێنانەوە:** بۆ کەسێک بە کار دەبرێ، کە هەمیشە هەر دەنگوباسی ناخۆش و شووم و پڕ نەگبەتی بێنێ.

**ئاوەڕوو:** شووێنی ئاوەزێ.

**ئاوەڕۆ:** (هەورا.) ئاوڕێژ، (دەر.) ئاوەڕوێ، جۆگەلەیەکە لە ماڵێدا، کە باران و چڵکاوی پێدا دەچێتە دەرەوە، دەراو.

**ئاوەڕۆگە:** بڕوانە: ئاوەڕۆ.

**ئاوەڕووت:** پەڕپووت، ڕووت بوونی سەرو پێی ئاژاڵ و باڵندانی سەربڕاو لە تووک و خوری بەهۆی ئاوی گەرمەوە. ــ کران: پرچکین، خاوێنکرانەوە. ــ کردن: داڕنین، ڕنینەوە، پەرتاندن، پرچکاندن، پەڕ پووتکردن، خاوێن کردنەوە، پاککردنەوە، پەڕو پۆ لێکردنەوە.

**ئاوڕوونکەرە:** ئاو ڕۆشنکەرە.

**ئاوەڕووی (دەر.):** دەربەندی.

**ئاوەڕێژ:** شووێنێکە لێژبێ، کە ئاوەڕۆی شووێنێکی تری پێدا بڕوات، ئاوڕێژگە.

**ئاوەڕێس (خۆ.):** کرێکە لە کەژۆک دروست کرابێ، جوورە جاوێکی سپی تایبە تییە.

**ئاوەڕیس:** جاوی داخداخ و خەتخەت. ــ کردن: جاوی داخداخ دروستکردن.

**ئاوەزا:** ئاوەزێ، زوی، زۆنگ.

**ئاوەزێ:** ئاڤزێ، برینێکە ئاوی بدزێ و نەستووربێ. زەوییەکە ئاوی لێ بزێتەوە، زەوییەکە ئاوی تێکەڕابێ.

**ئاوەزیان:** خۆناسین، تەمەنی خۆناسین.

**ئاوەزێڕ:** ئاوزێڕ، زێڕ کفت، ئاڤزێر.

**ئاوەژنە:** ئاوشکێنە، کەلگە، شووێنی داشکاندنی ئاو لە جۆگاندا.

**ئاوەزێو:** زێوکفت، ئاڤ زیڤ.

**ئاوەژەنە:** کەلەبەرێکە کە لە پشت ئاشیدا ئاوی لێ دەشکێنرێ، کاتێکی بیانەوێ ئاش بنوێنن.

**ئاوەژوو:** کاڵاو پۆشاکی هەڵگەڕاوەوە، بەرواژی، وەرگێڕڕاو، وەرگێڵاو، بەرەواژ، واژی، تەرسە، هۆکدار، ڤاژی، هەڵگەڕاوەوە، (دەر.) هەڵگەردیاو، (خۆ.) قەلەوازی، هەڵەوگەڕ، پێچەوانە، بەرەواژوو، پاشبۆکی، چەواشە. ــ بوونەوە: هەڵگەڕانەوەی پۆشاک و ئیتر، وەرچەرخان، وەرگەڕان. ــ کردنەوە: هەڵگێڕانەوە، وەرگێڕان.

**ئاوەژێ:** بڕوانە: ئاوەژوو.

**ئاوەستێ (ڕۆژ.):** تەنگوچک.

**ئاوەسۆ:** ئەوپێستەیە زۆر لە ئاوێدا مابێتەوە. بە مرۆی بێ شەرم و ڕوودامالڕاویش دەگوترێ.

**ئاوەسوو:** بەرد یا دارێکە، کە ئاو سووبێتیەوە، پینەی پێڵاوێکییە سووا بێتەوە و لووس بووبێ. چەقەسوو، بێشەرم و ڕوودامالڕاو و نەبەز. نەزۆک، قسر.

**ئاوەسێ:** فەقێیانە و سۆرانی کراسە.

**ئاوەشکێنە:** بڕوانە: ئاوەژەنە.

**ئاوەکوڵ (کۆ.):** لێقەومان، ناخۆشی، ئاوی بەکوڵ.

**ئاوەکی (جا.، سل.، شار.):** ئاوارە، دەربەدەر بۆ ئاژاڵێک بەکاردەبرێ هەتەرە و گووێ کوڕە بووبێ و کەوتبێتەلاوە، چتی ئاوی، تەڕ، پڕئاو، ڕەوان. ــ بوون: ئاوەکی کەوتن.

**ئاوەکی کەوتن:** ئاوارە و هەترە بوون لە شووێنی خۆی.

**ئاوەڵەکردن:** ڤەکرن، ڤەدان، گوشادکردنەوە، واکردنەوە.

**ئاوەڵ:** هاودەم.

**ئاوەڵانە:** ئەوەیە کە دەدرێ بە شووان بەرانبەر بە هێنانەوەی کار و بەرخی ساوا لە چیاوە بۆ خاوەنی.

**ئاوەگڵ:** گلاو، پیس. ــ بوون: گلاوبوون. ــ کردن: گلاکردن، حەوت جاران بە ئاو و گڵ شوشتن.

**ئاوەڵە:** کراوەوە، سەرئاوەڵە، بە تاک، (کە.) سەربەتاک، (دەر.) کراوە، بەش، والا، ڤالا، وەتاک، سەرنەپۆشراو، داچەقاو. ــ بوون: بەش بوونەوە (تەنها بۆ زارە)، داچەقاندن، کرانەوە. ــ کردنەوە: (بۆ زار) بەشکردنەوە، کردنەوە، داچەقاندن.

**ئاوەڵچنە:** قاقەزی ووشک کەرەوە، کاغەزێکی تەنکیشە چتی تێوە دەپێچرێ.

**ئاوەڵدامان:** بڕوانە: ئاوالکراس.

**ئاوەڵزوا:** بڕوانە: ئاوالزاوا.

**ئاوەڵکراس:** بڕوانە: ئاوالکراس.

**ئاوەنووس:** ئابەنووس، دارێکی ڕەشە مۆدنە و چتی دیکەی لێ دروستدەکرێ.

**ئەوەندە:** ئەمەندە، ئەندازەی چتێکی.

**ئاوەنیا:** دەغڵ و زەوی بەراو، زەوییەکە بەراو بێ، ڕەپستە، ئاڤانی، کۆڵەبست، کۆڵەبەس، (هەو.) ڕەباس، بەراو، پاراو، زەوی کشتوکاڵێکە وشکە وەرد نەبێ. دەغڵێکە پێش پەڵەی چاندرا بێ. زڕمندال.

**ئاوەناوچوون:** ئاوبەناو چوون (بۆ تووکە) واتا چوونێکە گەڕانەوەی نەبێ و لەناوچێ.

**ئاوەوەرە** (هەورا.): ڕاوی سەرکانی بۆ کوڕکوڕ و کەو.

**ئاوەوچەما**(هەورا.): ئاوی چاو.

**ئاوبەب:** هارباب.

**ئاوبارە:** بنە، بنە بەنگە، بەندی ئاوێ، جۆگەی ئاسن، جۆگەیەکە وەکوو پرد بەسەر جێگای قووڵ و نزمدا ئاوی پێدا دەپەڕێننەوە. جۆگەیەکی گەورەیە لە ڕۆژاوای شاری سلێمانی. هەلاڵەی هەنگ، مەیە و گەوهەری هەنگوینییەکە هەنگان لە گولانی وەردەگرن.

**ئاوباز:** مەلەوان.

**ئاوبازی:** مەلەوانی.

**ئاوبەئاوچوون:** بڕوانە: ئاوە و ئاو چوون.

**ئاوبەدەمە:** قوبوڵییەکی تەڕووبڕە کە زۆر لەسەر ئاگر نەمابێتەوە.

**ئاوبەر:** دەستە مێش هەنگوینێکە کێوییە کە دووای ئاوخوواردنەوە ڕاست بۆ هێلانەی خۆیان دەفڕن، ڕاوکەران وەشووێنیان دەکەوون بەو چەشنەی هێلانەکەیان دەدۆزنەوە، گۆیا هەنگەکان ئاوێ بۆ هێلانەکەیان دەبەن و لانادەنە جێگای دی. کەسێکیشە کە ئاو بە گۆزە و دەفر لە شووێنێکەوە بۆ شووێنێکی تر ببات.

**ئاوبەن:** ئاوبەند.

**ئاوبەند:** کەسێکە ئاوبەند بێ و دەردێکە لەنێو زگدا کۆدەبێتەوە دەیکوژێ. بۆ ئەم دەردە ئاوی جۆ زۆر باشە، چای گوڵی پنگی چاکی دەکاتەوە.

**ئاوبەندی:** نەخۆشی و دەردێکە لە نێو لەش و زگدا کۆدەبێتەوە، ئاوی جۆ و چای گوڵی پنگی چاکی دەکاتەوە.

**ئاوبڕا:** ئەوجێگەیە لە جۆگەدا کە ئاوی لێ بشکێ و ببڕێتەوە، بەند. دەردێکە لەبەر زۆر ئاوی سارد خوواردنەوە لە زستاناندا تووشی ئاژاڵان دەبێ و کوتوپڕ دەیکوژێ.

**ئاوبوون:** تاوانەوە، تاویانەوە، بۆ بەفر و سەهۆڵ وکانان بەکاردەبرێ. تەریق بوونەوە، شەرمەزاربوون.

ئاوپاش

**ئاوپاش:** مرازی ئاوپرژێن، ئاوپژێن، ئاوڕشێن، (هەورا.) ئاوپژگن، (باد.) ئاڤ پژ. کەسێکە ئاوڕشێنی بکات.

**ئاوپاشی:** ئاوپژێنی، ئاوڕژێنی.

**ئاوپاڵ** (ئەردە.): دەفرێکە چتی شلی پێ دەپاڵێورێ، کەوگیر، کەفگیر.

**ئاوپەڕ:** پووازێکە دەخرێتە پاڵ کونجی ئاشەوە بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ ئاوەکە لە ناوەڕاستی پەڕەکە بدات و بیسووڕێنێ. (دەر.) کاتێکە دەغڵ شیرەی تێدە تەزێ دەڵێن ئاو پەڕ بووە. پەرەسەندنی زامە بەهۆی برینی کۆنەوە. (کۆ.): ئاودانێکی سووکی شینایییە. نەخۆشییێکی ئاژاڵانە بەهۆی خوواردنەوەی ئاوی سارد و سەهۆڵاوی لە زستانێدا. ئاوڕشێن.

**ئاوپرژێن:** ئاپرژێن، (نە.) ئاوپژێن. ــ کردن: ئاپرژێن کردن.

**ئاوپژاندن:** ئاوڕشێن کردن.

**ئاوپژانن:** بڕوانە: ئاوپژاندن.

**ئاوپژگن** (هەورا.): ئاوپاش.

**ئاوپژێن** (نە.): تەنەکەیەکە ئاوڕشێنی پێدە کرێ، ئاپرژێن، ئاوپاشی. ــ کردن: ئاپرژێن کردن.

**ئاوپیدان:** ئاوتێکردن.

**ئاوتاڵ و سووڵ:** ئاوی تاڵ و سووێر کە بڵێن: ئاوی تاڵ و سووێری خوواردۆتەوە، واتا ئازار و ڕەنجی کێشاوە.

**ئاوتەلا:** ئاوی زێڕی.

**ئاوتێوەردان:** ئاو لە قاپ و مەنجەڵ و ئیتر وەردان و ڕژتن بۆ خاوێن کردنەوە.

**ئاوجز:** ئاودز.

**ئاوجۆ:** ئاوی جۆ، بیرە، میزرە.

**ئاوچاودان:** زاخاوی چاودان بەتەماشاکردنی ئافرەتێکی بێگانە، سەرنجدان.

**ئاوچاوسەندن:** مەبەس لە ترساندنە.

**ئاوچاوسەنن:** ئاوچاوسەندن.

**ئاوچایک:** ئاوی ساردو خۆش.

**ئاوچنین:** ئاوگرتنی میوە و هەندێ چتی تر. ئاوی پۆڵاوەرگرتن تانەرم بێ.

**ئاوخانە:** ئاودەستخانە، سەراو.

**ئاوخوواردن:** ئاڤ خارن، ئاونۆشکردن.

**ئاوخوواردنەوە:** ئاڤ ڤەخارن.

**ئاوخۆر:** ئافخوەر.

**ئاوخۆرە:** بادی ئاو تێدا خوواردنەوە، ئاوەخۆرە، ترگال، پیان. ئاسنێکی درێژە لە لغاوێدا دەچێتە نێو زاری وولاخی. نێوەڕاستی قووڵە، ئی واش هەیە کونە .

**ئاوخۆرەوە:** پەرداخ، (موک.) ناوەرووکە نەرمەکەی دارانە. ئاسنێکی درێژە لە لغاوێدا دەچێتە نێو زاری وولاخەوە نێوەڕاستی قووڵە و ئی واش هەیە کونە.

**ئاوخوری:** گۆزە، شەربە، ئاوخۆرگە، مەبەستی لە چۆم وکانی و جۆگە و ئیترە.

**ئاوخۆری:** دەفرێکە کە ئاوی پێ بخورێتەوە، شەربە و گۆزەڵەی ئاو، کاسە، جامۆلە.

**ئاوخۆش:** ئاوی خۆش.

**ئاوداخستن:** ئاوبەستن، ئاو بەرەلاکردن.

**ئاودار:** شووێنێکە کانی و ئاوی زۆر بێ، درەخت و سەوزایی و میوەی تەڕ و نازاو. بەئاو، ئاڤدار، بەتام و خۆش، پاراو، تەڕو پاراو و تروسکە دار، پڕئاو. تیغی جەوهەردار، گەوهەردار، پیرۆزە، مرواری. کەسێکە ئاوی هەبێ یا کێشکچی ئاو. چایچی.

**ئاودارخانە:** چایخانە، شووێنی ئاو.

**ئاوداری:** ئاڤداری، چایچێتی، خیگەی ئاوێ.

**ئاودەشتن:** ئاودان، ئاودێری، ئاویاری، ئاڤدان، ئاویاری. کردنەوەی ئاودێری.

**ئاودامان:** پۆشاکی شۆڕی تا سەر پێیان.

**ئاودان:** ئاودانی شیناوەردی، ئاوداشتن، وولاخ و ئاژاڵ ئاودان، ئاویاری، ئاودانی تیغ و کانان و پۆلاً. ئاوەدان، ئاودان، ڕەسا.

**ئاودانەوە:** تیغی سووربووەوە خستنە ناو ئاو تا ڕەقبێ و بڕشت پەیدا بکات.

**ئاودانی:** ئاوەدانی، ئاوایی.

**ئاودەر:** ئاودێر.

**ئاودەردان:** پالاوتن، پارزنین لە گۆزەو کووپەی تازە.

**ئاودەس:** بڕوانە: ئاودەست.

**ئاودەست:** پێشاو، کەنشت، ئاڤدەست، کەییل، چەشمە، ئاودەستخانە، ئاڤڕێژ، ئاڤڕێژن، ئاوخانە، کەنار ئاو.

**ئاودەستخانە:** ئاودەست، پێشاو، کەنیشت، ئاڤدەست، کەییل، چەشمە، ئاڤڕێژ، ئاڤڕێژن، ئاودەسخانە.

**ئاودەسخانە:** ئاودەستخانە.

**ئاودەل:** نێوی نێرینانە.

**ئاودەم:** هاودەم، لیک، ئاوی زار.

**ئاودەنگ:** ئاواڵ، هاواڵ، برادەر، کەسێکە دەنگت بیگاتێ بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کردنی.

**ئاودەنگی:** ئاواڵی، برادەرایەتی،هاودەمی.

**ئاودڕ:** گەڕ، چەمبل، دەلاڤ، کەند، کۆریان، شیو، خڕ، ئاڤدڕکە، جێگایەکە ئاو دڕیبێتی. خەندەکێکە ئاو دڕیبێتی.

**ئاودڕکە:** بڕوانە: ئاودڕ. شوێنێکە ئاو دڕاندبێتی و ئاویشی تێدا مابێتەوە.

**ئاودڕگە:** بڕوانە: ئاودڕ.

**ئاودز:** ئاوەدز، تەشەنەی برین، ئاوجز.

**ئاودزەک:** ئەو مرازەیە لە شرینقە، کە ئاو و دەرمانی هەڵدەمژێ، ئاو دووزەک.

**ئاودنان:** ئاوددان (شیرنیاتێکی ناسراوە).

**ئاودۆ:** دۆ، ماستاو.

**ئاودووزەک:** ئابدووزەک، شرینقە.

**ئاودیان:** ئاوی ددان، مینای ددان.

**ئاودێر:** ئاڤیار، کەسێکە ئاوی شیناوەردیان بدات بەمانگانە یا بە سالانە، (هەورا.) جەوان، (بابا.) قۆخڵ، (زرا.) وەراز، (سوور.) تووڕەوان، (هەورا.) گۆخڵ.

**ئاودێری:** ئاڤیاری، ئاویاری، ئاوداشتی، تووڕەوانی.

**ئاوور** (هەورا.): برسی. (زا.) ڕوخسارێکە بەسام و سەنگین و گران بێ، ئاگر، ئازەر، ئازر، ئایەر، ئایر، ئادیر، ئاهیر، یاگی، ئاتر، دژۆ، (هەورا.، ژا.) ئاهر، (بۆتا.، جز.) دژۆ. ـــ باران: ئاگر بارانە. ـــ بەردان: ئاگربەردان. ـــ تێ کەوتن: ئاوورتێبەر بوون. ـــ دان: ئاگردانی چەک و نیتر، تۆقاندن، تەقاندن، ئاوورگ. ـــ دران: تەقین، تۆقینی چەکان. ـــ کردنەوە: ئاگرکردنەوە، (باک.) دادان. بنیاتی شەڕوکێشە دامەزراندن. ـــ هەڵکران: ئاوورهەڵکران، ئاوور داگیرسان. ـــ هەڵکردن: ئاگرکردنەوە، ئاگرپێکردن، ئاگر داگیرساندن، (باک.) ئاگردادان. ـــ گرتن: گیرسەندن، داگیرساندن. ی بن کایە: تێچێن، تێکوڵ چێن، دووزمان، کووکە. (باک.) غەمزە، عیشوە.

**ئاووڕ:** ڕوو، یارمەتی، ڕووتێکردن.

**ئاووڕدانەوە:** سەر وەرسووڕاندن و ڕوانین، یارمەتی و کۆمەگ کردن.

**ئاورا** (هەورا.): برسی، وورسی.

**ئاوڕا:** هاوڕێ، برادەر، هاوبیرو باوەڕ.

**ئاوڕایی:** هەوڕێیی، هاوبیروباوەڕی.

**ئاورایی** (هەورا.): برسێتی، وورسیەتی.

**ئاورە:** ئاتەشەک، (هەورا.) هەوڵە فەڕەنگی، ئاگرۆکە، ئاگرۆشکە، ئاگرە، ئایرە، (دەر.) ئاگرەکە، برینێکی پیسەو پۆقژەییێکی زۆر پەیدا دەکا و زۆرتر لە ڕووی مندالان سەر هەڵدەدا و دەشتەنێتەوە و ئاوداریشە.

**ئاوڕەوشەنکەرەوە:** ئاوڕوونکەرەوە، گیاندارێکی ڕەشی گچکەیە بەسەر ئاوێ دادێت و دەچێ گۆیا کە ئاوەکە شلوێ کرابێ ڕوونی دەکاتەوە.

**ئاووچەما** (هەورا.):بڕوانە: ئاوە و چەما.

**ئاووربـاز:** ئاگرباز.

**ئاووربازی:** ئاگربازی.

**ئاووربایەگان:** ئازەربایجان.

**ئاووڕپەرست:** ئاگرپەرست. ـــ ی: ئاگرپەرستی.

**ئاوورخان:** ئاگرخان، ئارتوون.

**ئاووڕدار:** ئاگردار.

**ئاووردان:** ئاگردان، گۆڕک، کوچکاوور، (دەر.) کوچکانی، سووتان، تەقاندن، تۆقاندنی چەکان، ئاووردان.

**ئاووڕدانەوە:** بۆ ئەملاولای پشتەوە تەماشاکردن، هاووڕدانەوە، بۆ تەماشا هاووڕدانەوە. یارمەتیدان، کۆمەگی کردن، دەستگرتن، میهرەبانیکردن، ڕوودان، ڕووتێکردن.

**ئاووڕلێدانەوە:** یارمەتی و کۆمەگی کردن، لالێکردنەوە، هێنان.

**ئاووردەیۆیـاگێ** (هەورا.): هێنانەوەجێی ئەندامی لە جێ چوو.

**ئاووردن:** هاووردن، هێنان.

**ئاووردەی** (هەورا.): هێنان.

**ئاووردوو:** ئاگردوو، دارودوو، دەس ئایەر، (هەورا.) سووتمان، سووتەمەنی، دارودەوەن و پووشوگووێنی و چتی سووتەمەنی، سۆتەنی.

**ئاوڕژان:** ڕژانی ئاو. تووتکان، بۆ نێر و مێیان بەکاردەبرێ، تۆو (مەنی)هاتنەوە. کە چتێک بخورێ بلێن دا بەشی ئەو مندالەی بدە با تووی نەشکێ گۆیا، کە تۆوی بتکێ مندالی نابێ، ڕەنگ ڕژان، نەخشە دانران.

**ئاوڕژاندن:** ڕژتنی ئاو، ڕشتنی ئاو. تووتکاندن، مەنی فڕێدان. ڕەنگ ڕژتن.

**ئاوڕژتن:** ئاوڕژاندن. ڕەنگ ڕژتن، ئاڤڕێتن.

**ئاوڕژێن:** ئاوڕشێن، ئاپڕژێن.

**ئاوڕشاندن:** ئاولێ ڕشاندن، ئاپڕژێن کردن.

**ئاوڕشانن:** بڕوانە: ئاوڕشاندن.

**ئاوڕشێن:** ئاپڕژێنکار، ئەو کەسەیە، کە ئاوێ بەزەویدا بڕشێنێ، پڕژاندنی ئاو بە زەویدا.

**ئاوورکوژێن:** ئاوور کووژێنەوە.

**ئاگرکوژێنەوە:** ئاوورکوژێن.

**ئاوورگ:** گۆڕک، گۆرکە، (دزە.) ئاوورگە، کووانوو، (دەر.) کووچک کووانی، ئاووردان، ئەرگ، کۆچک، (باڵە.) پفکە، (جا.) کووانک، (دەر.) کووانی، (هەورا.) ئاووردان، (هەورا.) ئایرگا، (باک.) بندن.

**ئاورنگ:** نێوی ئافرەتانە، پرشنگ، پڕشەنگ، بریسکانەوە. (دەر.) پشک. هەستێکی نەرم و لووس و کارەباییە کە دەست بە ئاوریشمدا بێنی دیار دەکات ودەڵێن ئاورینگان دێنێ.

**ئاورنگدان:** تروسکانەوە، بریسکانەوە.

**ئاوڕوو** (هەورا.): ئابڕوو، ئاوی ڕوو، ڕەنگی ڕوو، شەرم، ڕێز، پایە، گەورەیی، شان و شکۆ. بێ ـــ: بێ ئابڕوو، بێشەرم.

**ئاوڕووبردن** (هەورا.): ئابڕووبردن، ریسواکردن، بەدناو کردنی کەسێک.

**ئاوروپا:** بڕوانە: ئوڕووپا.

**ئاوڕووت:** ئاوەڕووت. ـــ کردن: ئاوەڕووتکردن.

**ئاورۆچکە:** ئاورژکە، ئاگرژشکە، گڕمەلا، ئایرە قوڵە، ئاگرۆکانێ، ئاگرژچکەی مندڵان.

**ئاوڕووچووانن** (هەورا.): ئابڕووچوواندن.

**ئاوڕووچووگ:** ئابڕووچوو، بەدناو.

**ئاوڕووچوون:** ئابڕووبران، بەدناو بوون.

**ئاوڕوودار** (هەورا.): ئابڕوودار.

**ئاوڕووداری** (هەورا.): ئابڕووداری.

**ئاوڕۆشنکەرە:** بڕوانە: ئاوڕەوشەنکەرەوە.

**ئاوڕۆشنکەرەوە:** ئاوڕوونکەرەوە.

**ئاورۆکە:** بڕوانە: ئاورژچکە.

**ئاوڕوومەند:** ئابڕوومەند. ـــ ی: ئابڕوومەندی.

**ئاوڕوونکەرە:** بڕوانە: ئاوڕوونکەرەوە.

**ئاوڕوونکەرەوە:** ئاوڕەوشەنکەرەوە، گیاندارێکی ڕەشی گچکەیە بەسەرئاوێدادێت و دەچێ گۆیا کە ئاوەکە قوڕاوولێخن بێ ئەو ڕوونی دەکاتەوە.

**ئاوڕێ:** هاوڕێ، برادەر.

**ئاوری بنکایە:** تەلاقرەش، دووزمان، مسمەدە، سەریەگێچەڵ، دووڕوو.

**ئاوڕێژ** (هەورا.): تاڤگە، پڕژ، ئاوڕێژگە، ئاوەڕژ، ئاودەست. (موک.) کەسێکە ئاوی بڕێژێ، کەسێکە ئاوی مردوو بڕێژێ لەکاتی شووشتنیدا.

**ئاوڕێژگە:** تاڤگە، پڕژ، ئاوڕێژ، جێگایەکی بڵندە، کە ئاوی لێ بڕژێتە خووارەوە.

**ئاوری ژێرکایە:** بڕوانە: ئاوری بنکایە.

**ئاوڕیش:** بەگژ، بەرەنگار. ـــ بوون: بەگژداچوون، بەرەنگاری کەسێکی بوون، تێک گیران، هەڤڕیشی ئێک بین. ـــ کردن: بەگژداهێنان، بەرەنگارکردن.

**ئاوریشم:** (هەورا.) ئارمووش، هەڤرووشم، هەوریشم، هەڤریشم، هەڤرمێش، کرمێکی تایبەتییە قۆزاخەی دەکات و جل و پارچەی ئافرەتانی لێ دروستدەکرێ.

**ئاوریشمی:** ئارمووشی، (باک.) کەسرەوان، پارچەی ئاوریشمی: شاڵی کەسرەوان، هەڤڕووشمی. ـــ کێوی: کەژۆک. ـــ بادراو: خەیاتە.

**ئاوڕیشی:** بەگژ یەکتریدا هاتن، تێک گیران، بەرەنگاری.

**ئارین:** ئاگرین، ئارگۆن، وەکوئاووری، وەئاووری چوو، ڕەنگی ئاووری.

**ئاورینگ:** ئاوتووێ، ئالوو یا ئێشی برینانە، کە تینی بکاتە ئەملاولا. بەژانێکی دەمەکیش دەڵێن لە لاقی بەقەدەر قەسپێکی ئەستوور دەکات و دووایە چاک دەبێتەوە.

**ئاورینگ:** ئاورنگ، هەستێکی نەرم و لووس لە تینێکی سووکی کارەباییدا کاتێکی، کە دەست بە ئاوریشمیدا بهێنرێ هەستی پێ دەکرێ دەڵێن ئاورینگان دێنێ.

**ئاورێیی:** هاوڕێیی، برادەرایەتی.

**ئاوزا:** هاوزێ، هاواڵ، هاوتەمەن. زنە، زنەک، قۆیە، زۆنک.

**ئاوزان:** زانین، تووانایی، تووانین بۆ کردنی کارێک، ئەم ووتەیە هەر لە ووتاری نەبوون (نفی)دا بەکاردێنرێ: ئازاد نای ئاووزێ کە تەماشای وانەکانی بکات، یا تەماشا شووان دەی ئاوزێ دەم و چاوی بشوا؟ واتە نایان ئاووزێ.

**ئاوزانەچاو:** چاوتەڕ بوون بە هۆی خەفەتێکەوە.

**ئاوزانەدەم:** ئاولەدەمکەڕان لە کاتی دیتنی خواردنێک و حەزلێ کردنیدا.

**ئاوزاینەچاو:** ئاو لە چاوگەڕان، فرمێسک داهاتن.

**ئاوزاینەدەم:** ئاولەدەمگەڕان.

**ئاوزە:** ئاوزێ، هاوزێ، هاوشان.

**ئاوزنگ** (خۆ.): ئاویلکەی سەرە مەرگێیە، ئاوزینک.

**ئاوزەنگی:** زەنگوو، ڕکێڤ، ویزەنگی، مەنەک، دووئاسنە بە ڕاست و چەپی زینەوە سووار پێی تێدەخات.

**ئاوزەنگی تەقێن:** بڕێتییە لە ئاودانی وولاخ واتا کەسێکە، کە وولاخی ئاودەدات.

**ئاوزەنگیدار:** بەپێی ئەو کەسانە دەڵێن، کە پشتەکەی قۆقز بێ.

**ئاوزەنگی لێدان:** لێخوڕینی وولاخی بەزین.

**ئاوزوونە:** ئاڵقەزوونە، ئاسنێکی بەئاڵقە و زمانەدارە پشتێندو تەنگەی پێ توند دەکرێ.

**ئاوزێ:** ئاوزە، ئاواڵ، هاوتەمەن، جمک، دووانە، هاواڵ، هاوشان.

**ئاوزیاگ** (ئەردە.): تێکەیشتوو، تووانا، تێکەییک.

**ئاوزێیی:** هاوتەمەنی، هاوشانی.

**ئاوزیان:** بڕوانە: ئاووزان.

**ئاوزین:** بڕوانە: ئاوزان.

**ئاوزینه:** ئالقەزوونەی قۆندرەو هی دی، ئاوزوونه.

**ئاوزینگ:** ئاوزنگ، گیانەڵلا، ئاویلکەی سەرە مەرگییە، (بابا.) گیانەللاّ، هەوزینگ. ـــ دان: هەوزینگدان، سەرەمەرگ.

**ئاوژێرکا:** بڕوانە: ئاوی ژێر کایە.

**ئاووس:** (باک.) ئاڤس، هاووس، دووگیان، زگپڕ، (خۆ.) تلدار، (سوور.) بەتۆل، تۆلدار، بەزگ، زگ هەبوو، زگدار، تینگاوتینگ هاتوو، (باد.) بەتێشت. ـــ بوون: زگپڕبوون، هەڵزەقین، بسەخل بوون. ـــ کردن: زگپڕکردن، تۆلپڕکردن، ئاڤساندن.

**ئاووسان:** باکردن، هەلاّمسان، پەقان، ئەستووربوون، بەرزبوونەوە و هەڵکفانی شوێنێک لە ئەندامی گیانداران لە بەر هەر ئازارێکی بێ.

**ئاوساندن:** هەلاّمساندن، پەقاندن، ئەستوورکردن، وەرماندن، بەلکردن.

**ئاوساو:** هەلاّمساو، پەقاو، دێمگر.

**ئاوسەرکەفتن:** ئاوپۆشی، سەرکەوتنی ئاوو داگرتنی.

**ئاوسەرکەم:** ژار، بەلەنگاز، ژارۆ، کەمدەست، هەژیر، هاوسەرکەم، پێداویست، دەستکورت، هەژار، ئاتاج.

**ئاوسەرکەمی:** هاوسەرکەمی، دەستکورتی، هەژاری، ئاتاجی، پێداویستی، کەماسی، کەمایەسی، کەمدەستی، کەموکورتی.

**ئاوسێ:** دەراوسێ، هاوسێ، (هەورا.) هامسا.

**ئاوسیان:** بڕوانە: ئاووسان.

**ئاووش** (ڕۆژ.): باوەش، ئامێز، واووشە.

**ئاوشار:** ئاڤگە، ئاف.

**ئاوشان:** هاوشان، هاوکووف، ئاوکووف، هاوزێ.

**ئاوشانی:** هاوشانی، هاوکووفی.

**ئاوف:** ئای، ئاه.

**ئاوڤاکردن** (ڕەوا.): بردنەژوور، لەناونان.

**ئاوقە** (ئەردە.): کەسێکە پەلاماری چتێکی دابێ وخۆی پێدا هەڵزنی بێ، تووشبوو، دووچار. ـــ بوون: تووشبوون، دووچارهاتن.

**ئاوقەد:** کەسێکە، کە پەلاماری چتێکی دابێ و پێیدا هەڵزنی بێ و پێیدا هەڵگەڕابێ. ـــ بوون: پەلاماردانی شتێک و پێیدا هەڵزنین.

**ئاوکە** (کۆ.): جوورە ترێیەکە.

**ئاوکردن:** بۆ وێنە لەنانی پڕژاندن بۆ نەرمبوونەوەی، تواندنەوە، تاواندنەوە. ـــ ڕەق ئاو ی چاو: فرمێسک لێوەهاتن.

**ئاوکردنەژێر:** دەرکردن، زۆرجاران، کە شێتێک بچێتە هەرماڵ یا هەر شوێنێکی دانیشێ و نەڕووات، کە بیانەوێ دەریکەن ئەملاولای ئاوڕشێن دەکەن، کە هەر نەڕۆیشت ئاوی دەڕژێننە بنیو بۆی دەردەچێ.

**ئاوکولاّنگ** (ئەردە.): ئاوی داغ، ئاوی کولاّو.

**ئاوکێش:** ئاوبەر، ئاوهاوور، ئاودەر، ئاڤکێش، کەسێکە بە مانگانە یا بە ڕۆژانە ئاو بێنێ، خواردنێکە کەئاوی زۆر بەسەردا بخورێتەوە. ـــ ی: ئاوبەری.

**ئاوگەردان:** قاپێکی مسینی کلک درێژە لە کاتی چل شووشتن وئیدیدا ئاوی پێ لە مەنجەڵ هەڵدێنجرێ.

**ئاوگەرم:** گەراو، پلاّخ، ئاوی کانان، ئاوی گەرم.

**ئاوگەڵە** (خۆ.): ئاژاڵێکە بچێتە ناو هەر مێگەلێکی تر ڕام بێ و نەسڵەمێتەوە.

**ئاوگرتن:** نۆرە ئاو لە گوندێکی، کە ئاو بەشی هەموو جووتیاران نەکا ناچار بەنۆرە هەر ڕۆژە جووتیارێ ئاودەگرێ بۆ ئاودانی کشتوکاڵەکانی. خۆشبوون و ئاوتێزانی میوەیەکە، کە گەیشتبێتە ڕادەی وەی بخورێ. زەوییەکە ئاوی گرتبێتەوە، ئاودرابێ.

**ئاوگردان:** بڕوانە: ئاوگەردان.

**ئاوگۆشت:** گۆشتاو، شۆرباوی گۆشتی.

**ئاوگیل:** لەش، تەن، قالب، هەرگ، هەرگاو، قوڕاو.

**ئاوگیر:** زەلکاو، زۆنکاو، گۆل، چاڵ. ـــ ی گەرماوی: حەوزی گەرماوی، (جا.) ئاوگەردان.

**ئاوگیرکردن:** خواردنی چتێکی کەم بۆ لابردنی برسیتی لە پێش نانخواردنێدا بە تۆزێک دەڵێن زۆر برسی بوو، ئاوگیرێکم کرد.

**ئاوگیری:** ئاو لێوەرگرتنی پۆلاّو ئیتر بۆ نەرمبوونی، ئەندازەی ئاوگرتن.

**ئاولاّوی:** گڕوێ، خرۆێرکەدار، ئاوڵەدار.

**ئاوڵە** (زەن.، بابا.، دەر.، هەورا.): (هەو.) خووریکە، هاوڵە، هاوڵە سێ جوورە: ئاوڵەی بلاّو: خرۆێرکەی بلاّو. ـــ ی خوێنپڕ: خرۆێرکەی خوێن پڕ. ـــ ی سفت: خرۆێرکەی سفت، وورده برین و زیپکەیەکە لە ئەندامی مندالاّن دێتە دەرێ.

**ئاوڵە دڵرۆیین:** مەبەس لە برسێتییەکی زۆرە.

**ئاوڵە دنگا کوتان:** مەبەس لە کاروباری بێ سوودە و گوفتاری پووچ.

**ئاو لە دنگا کوتاندن:** بڕوانە: ئاوڵە دنگا کوتان.

**ئاوڵەمە** (هەورا.): منداڵێکی لەبەرچووی نەوتۆیە، کە هێشتا ئەندامی لێ نەڕووابێ، (ئەردە.) بێچووی ئاوزگی ئاژالاّنە، کە دووای سەربڕینی دایکی دەخورێ.

**ئاولک** (شار.): بلۆقی دەست و پێیانە کە لەبەر زەبری کارکردن و یا ڕۆیشتن پەیدا دەبێ.

**ئاولووت:** ئاوی کەپۆ.

**ئاولێچوون:** ئاودەلاّندنی قاپ و دیزە و گۆزەی ئیترە، کە درزی هەبێ.

**ئاولیخو:** (؟).

**ئاوماڵ** (ڕۆژ.): دراوسێ، هاوسێ، دەراوسێ، ئاوسێ، لێک نزیک، هاوماڵ، خۆیی، ئاوماڵک.

**ئاوماڵک:** ئەو پووش و پەلاّش و هەلاّش و چیلکە و دارانەیە، کە لافاو لە گەڵ خۆی ڕایپالێبێ و بردبێتی، مەردوم کۆی دەکەنەوە بۆ سووتاندن، قافوو.

**ئاومردار:** ئارەقەی مردوو، چیامانی، چایانی، ئاوی پەسیوی.

**ئاومرواری:** ئاوسپی، جوورە ئاوێکە، کە هاتە ناو چاوکوێری دەکات، بەلاّم بە میل لێدانی ڕووناک دەبێتەوە.

**ئاوملێ:** هاوملێ، هاونێلە، هاوجووت. ـــ بوون: بوون بە هاودەم. ـــ کردن: وولاّخێکی لەگەڵ وولاّخێکی تر پێکەوە جەلەکردن و بە یەکەوە بەستنەوە.

**ئاوەنگ:** هاوون، هاوونگ، ئاوان، هاوان، هۆد، (باک.) جەوهنی، دەسکاوونگ، نمێکە لە شەوانی سایەقەی بەهارێدا دەکەوێتە سەر گژو

گیایان تا خۆر هەڵدێ ئەوجا ئامێنێ، شەوم، خوناوی بەهارییە، ئاوونگە، خوناو، ئاڤینگ، ترێی مێلاق.

**ئاوویای** (هەورا.): مەنی، ئاوی مرۆڤ.

**ئاووتاو:** بەکوڵ، جەخت، بەدڵ: فیسارە کەس بە ئاووتاوێکەوە قسەکەی دەگێڕاوە واتە بەجەخت و بە کوڵ و دڵ. دارویەرد.

**ئاوودان:** دان و ئاو پێکەوە.

**ئاوور:** ئاگر، ئازەر، ئاترە، ئاڤر، (هەورا.) ئاهیر. ئاووس.

**ئاوور**(هەورا.): ئاخوڕ. لا، ڕوو وەرگێڕان. ــ دانەوە: ڕوویەلادا وەرگێڕان، لالێکردنەوە، لاکردنەوە بەلای ڕاست یا چەپدا.

**ئاووردەی** (هەورا.): هێنان.

**ئاوورلێدانەوە:** دەستگرتن، یارمەتیدان.

**ئاووگڵ:** سروشت: ئاوورگڵەکەی بەدە، ووتەیەکە بۆ کەسێک بەکار دەبرێ، کە دوور لە نیشتمانی خۆی بمرێ دەڵێن: لە ئاوورگڵی وولاتی خۆی بەری بوو، کە لە دوورەوە بێتەوەو بمرێ و یا بە مردوویی بیهێننەوە دەڵێن ئاوورگڵ هێنایەوە، مزومافی دانیشتن.

**ئاووگۆشت:** گۆشتاو.

**ئاوونە:** میلاو.

**ئاوونگ:** بڕوانە: ئاونگ، شەوم.

**ئاووڵ** (هەورا.): نەوان، نوێن، جۆگەی سەر داپۆشراو. ئاودڕن، شیو، دۆڵ، دەرە.

**ئاوونگە** (زمن.): شەوم، ئاوونگ.

**ئاوونگی** (هەورا.): مێلاق، شەوم.

**ئاوهاتنەوە:** وەرسیان، وەرسان، لەکاتی گانکردن و نیتردا ئاسوودە بوون.

**ئاوهاوێژ:** فووارە.

**ئاوهەڵچن:** ئاوچین، ووشککەرەوە.

**ئاوهەڵکردن:** ئاوکردنە سەر شوێنێک بۆ ئاودانی، ئاوداشکاندن، ئاوداخستن.

**ئاووهەوا:** هەوا و ئاو، کەش، کژ.

**ئاوهۆرشان** (هەورا.): ئاوهاوێژ، فووارە.

**ئاوهێنانەوە:** مەنی هێنانەوە، خۆ دامرکاندن بەدەست، دەسپەڕ.

**ئاوهێناندنەوە:** وەرسیاندن، لە کاتی جووتبوونێدا.

**ئاوی، ئاڤی:** ڕەنگی ئاسمانی ڕوونتر، ئابی، ئاوڕەنگ، ڕەنگی ئاوێ. زیندەوەرانی ئاوێ. ئاویە، بەراو، ئاوەنیا، ئاڤی، زەوی و شیناییکە بە ئاو پەروەردە بکرێ، (هەورا.) ئاو.

**ئاویار:** ئاودێر، ئاڤیار، ئاوێر.

**ئاویار:** ئاودێر.

**ئاویاری:** ئاودێری، ئاوداشتی، ئاڤیاری.

**ئاویە:** ئاوی، بەراو، زەوی و میوەی بەراو. سوواخ.

**ئاویەدان:** سوواخدان.

**ئاویەو** (هەورا.): ئاوی جۆ.

**ئاوی ئاچنۆ** (هەورا.): ئاوی دەدەڵێنێ.

**ئاوی پرژ:** ئاڤگە، سوولاف، ئاڤگەییکە لە سەکران زۆر ساردوخۆشە.

**ئاوی تاڵ و سووێر:** مەبەس لە ڕەنج و ئازار چەژتنە، بڕوانە: ئاو تاڵ و سوێ.

**ئاوێتە:** تێکەڵاو، تێکەڵ، ئامێتە.

**ئاوێتە** (باد.، بار.): پێشک.

**ئاوی چاودان:** ئاوی دەمدان، ترساندن.

**ئاوی دەمدان:** ئازارکردن، ترساندن، هەڕەشە لێ کردن.

**ئاوی ددان دان:** بڕوانە: ئاوی دەمدان.

**ئاوێر:** ئاودێر، ئاڤدێر، ئاویار.

**ئاویر**(هەورا.): ئاوور، ئاگر.

**ئاوی ڕەش:** ڕەشاوێکە، کە چووە پەردەی چاوەوە کوێری دەکاونیتر ڕووناکی نابینێ.

**ئاویرگا** (هەورا.): ئاگردان.

**ئاوی ڕوو:** ئابڕوو، ئاوڕوو.

**ئاوێز:** چتێکە دارۆچکە کرابێ، هەڵاوەسرابێ.

**ئاوی زار:** ئاڤدەم، لیک، ئاوی زاری، (هەورا.) ڕینگاو.

**ئاوی زاردان:** هەڕەشە لێکردن، ترساندن، ئاوی چاودان.

**ئاوێزان:** هەڵاوەسراوە، داڵۆچکە، دلووزکە.

**ئاوێزە** (جا.): هەڵاوەسراو، چرایێکە شووشەی گەورەی پلپلەدارە بە میچەوە هەڵاوەسراوە و هەر لقێکی چرایەکی تێدا هەڵکراوە لە شەوێدا.

**ئاوێژ:** بڕوانە: ئاوێژەر.

**ئاویژە** (کۆ.): بەراو، ئاویە، ئاوەنیا، زەوی و زارو شیناوەردی ئاوییە، (شار.) جوورە ترێزۆێکی باریک و درێژە.

**ئاوێژەر:** ئاوێژ، ئاوێژیار، هاوێژ، وەشێن، وەشێنەر، هاوێژەر، کەسێکە چتی باوێ و فڕێ بدات.

**ئاوێژتن:** تێ ئاوێژتن، فڕێدان، هاڤێتن، ئاڤێتن، هاوێژتن، خستن، پەرتکردن، باوێژە، پۆڤێژە.

**ئاوێژیار:** بڕوانە: ئاوێژەر.

**ئاوێستا:** بڕوانە: ئاڤێستا.

**ئاوی سیاوە** (هەورا.): ئاوی ڕەش.

**ئاوێشتن:** ئاوێژتن، فڕێدان، هاوێژتن.

**ئاوی شیلەتین** (هەورا.): ئاوی شیرەتین، ئاوی شیلەی گەرم.

ئاوێنە

**ئاوی گەرم:** ئاوێکە گەرم بێ. مەبەس لە فرمێسکە.

**ئاویلکە:** ئاوزینک، هەوزینک، ئاهو هەناسەی هەرەدوایی دوواگیان، سەرەمەرگ، گیانەڵلا، گیانە لاو. (کۆ.) خەلیلی، جوورە ترێیەکە.

**ئاوێنە:** نەینۆک، نەینک، وێنەی ئاو، ئاووێنە، ڕۆنایی، (باک.) درووف، قبالە، (جا.، هەورا.) جام، (هەمە.) جامەک، (باک.) قۆدک، (شوان.، جا.) باڵعبان، (موک.) ڕۆگە، ئاوێنە. ــ ی باڵانوێن: ئاوێنەی گەورەیە. (موک.) ــ ی بەرد: ئاوێنەی بەرد و بلووریین. ــ بەند: شوێنێکە بەدیوارەکانیەوە زۆر ئاوێنە چەسپکرابێ. ــ ی گچکە: قۆدیلە.

**ئاوی وەشەن** (هەورا.): ئاوی خۆش.

**ئەوی ها بەبیڵەو:** توانا، بەرێز.

**ئاه:** داخ، داخی داخـانم، حـەیف، موخـابین، ئـاخ، ئـاوف، ئـای، ئـۆه، ئۆف، (باک.) ئاخن، لـەکاتی ناهومێدی و ئازار و چارە ڕەشێتی و داخ و خەفەتدا دەردەبڕیٚ، پشوو، پشی. هەناسە: ئاهی من ئەوی گرت.

**ئاهکێشان:** (باک.) ئاخین، ئـاه هەڵکێشان: ئـاخین، ئـاهی تێدا نـەماوە: ئاهی تیا نەماگە.

**ئاها:** ئائا، پیـاح، حـەکوو، هـەیها، یـا، حـا، ئاهـا، هـا، پیـاو، ئـەها، تەق، (خۆ.) هاها، هەللا، حەتەق، تەح، تەحا، پەح، پەحا، هـەرک، واه، پیاح، هەو، (باک.) پیبیک، بۆواق و ووڕمان و سەر سووڕمانێیە، ئاریٚ، ئـەک، دەک، ئـەک ئـەک، بۆ ئاگادارکردنێیـە و بـۆ بیدارکردنەوەیـە، داخـوا بەراستیتە، حەو، حێو، هاها، لـەکاتی گەمەپێکردنێدا بەکاردەبریٚ.

**ئاهاء:** پیا، پیاح، پی (باک.)، هاها، هەللا، تەحا، پەح، پـەحا، (بـاک.) حەکوو، پیبیک.

**ئاهار:** شۆیەکە بەشتی تەنراوە وە بیٚ، ئاش. ـــ دان: شۆدان، ئاش مالّی.

**ئاهەک** (هەورا.): قسلّ.

**ئاهەن ڕوبا:** ئاسن ڕفیٚن، موگناتیس.

**ئاهەنگ:** سەرەتا، پێشدەستی، لۆغانە، لووخانە، سـک وسـەودا، بـەزم، دەماخ، ڕەزم، زەماوەند، شادی و گۆوەند لـەکاتی شایی یـا منـداڵ بـوون و یا ژنهێنان و خەتەنە سووراندا. (باک.) سۆز، نەزم.

**ئاهەنگدار:** شادیهێنەر. ـ ی: شادمانی.

**ئاهەنگ گرتن:** پێکهێنانی ئاهەنگ و کۆبوونەوە بۆی.

**ئـاهـەنـگ گێڕ:** کەسێکە ئاهـەنگیٚ بـە گۆرانـی و سـازو ئـاوازو خۆشـی ڕابووێری.

**ئاهەنگ گێڕان:** ئاهەنگ هەڵسووڕاندن.

**ئاهەنگی مۆسیقا:** نەزمی مۆسیقا.

**ئاهر** (ژا.): ئاوور، ئاگر، ئازەر، ئاتر.

**ئاهرمەلۆچ** (هەورا.): ئایەنمەل، باڵندەیێکی بەڵەکی تاجدارە.

**ئاە کێشای:** ئاه کێشان.

**ئاە کێشتەی** (هەورا.): ئاه کێشان.

**ئاهگە:** ئاخگە، ئاگە، ئاستان.

**ئاهن** (لو.): ئاسن.

**ئـاهۆ** (مـوک.): ئـەیهۆ، ئـازار، دەرد، لـە کـاتی نەخۆشـی و تووڕەییـدا بەکاردەبرێت، پەتا، قڕان، فیٚ، نەنگ.

**ئاهوو:** ئاسک.

**ئاهورامزدە:** (ئاو.) ئەهورەمەزدا، یەزدانی گەورە و تاک و تەنیا.

**ئاهوناڵە:** دادوفوغان.

**ئاهەهەڵکێشان:** ئاخەهەڵکێشان.

**ئاهی:** هەناسەی دڵ.

**ئاهی دڵ:** بڕوانە: ئاهی.

**ئاهێر** (هەورا.): ئاوور، ئاگر، ئازەر، ئاتر.

**ئاهێر:** ئاگر.

**ئاهی سارد:** هەناسەی سارد، نائومێدی دڵشکاوی، ڕەنجەڕۆیی.

**ئاهیستە:** هێدی و لەسەرە خۆ.

**ئاهیستەیی:** هێدێتی و لەسەرەخۆیی.

**ئاهیی** (لو.): ئاسک.

**ئاهێن** (باک.): خەم، خەفەت، پەرۆش.

**ئاهییر** (هەورا.): ئاگر، ئاوور، ئازەر، ئاتر.

**ئاهیین** (باک.): خەم، خەفەت، پەرۆش، خوواردن، ناڵاندن، ناڵین.

**ئای:** لەکاتی پێکەیشتنی و یا دیتنی و یا بیستنی کارەساتێکەو یا لـە سەردەمی واق و ووڕمانێدا بـەکاردەبریٚ، ئاخ، ئاووف، ئۆف، ئـاه، ئۆه، ئەدی، ئەی، ئۆی، ئاییش، ئۆ، وای، های، ئۆخ.

**ئای:** وای، ووشەیێکە بۆ گەپ لیٚدان و سەر سووڕمانێیە.

**ئایا:** (خۆ.) دامەکە. ئایاکوو، داخووم، مەرازی پرسـیارە: (باک.) چما، ئارا، ئەریٚ، ئاخۆ، داخۆ، چمان، ئەیە، ما، (باد.) گەلۆ تۆ بڵێی، دەڵێی. ئەحمەدی خانی دەفەرمووی:

> ئایا بە چ وەجهیٚ مانە مەحرووم؟
> بالجملە ژ بۆ چ بوونە مەحکووم؟

**ئایاکوو:** بڕوانە: ئایا.

**ئایای:** جوورە گۆرانیێکی کوردییە، ئایئای.

**ئای ئای (ئایئای):** جوورە گۆرانیێکی کۆنی کوردییە. چۆن چۆن، لـەکاتی سەرزەنش و بەسەر ڕێشتنیدا بەکاردەبریٚ.

**ئایە** (کۆ.): قازانج، سوود، بەلاّن لەگەلّ مایە بەکاردەبریٚ: ئایەومایە.

**ئایەر** (هەورا.): ئاوور، ئاگر، ئاڤر، ئاتر، ئازەر.

**ئایەرگا** (هەورا.): ئاوورگ.

**ئایرە** (هەورا.): ئاورە، ئاگرۆکەی ڕووی منداڵان.

**ئایرەقوڵە** (هەورا.): ئاورۆچکەی منداڵان.

**ئایرگا:** بڕوانە: ئایەرگا.

**ئایرۆ:** ڕۆ، ئەیرۆ، وەیرۆ، ئافرەتـان لـەکاتی تەنگانـەو لێقەومانێدا وەکوو هاوار و حەیف و موخابین بەکاری دەبەن.

**ئـایش:** ئـای، ئـاخ، ئـاه، ئـۆه، ئـۆخ، لـەکاتی ئێـش و ئـۆف پێکەیشـتنێدا بەکاری دەبەن.

**ئایشەوان** (هەورا.، زەن.، دەر.): ئاشەوان.

**ئایشۆکی** (کۆ.، موک.): جوورە هەڵپەڕینێکە، چەشنە گۆرانییێکیشە.

**ئایلّ** (ڕۆژ.، کە.): منداڵ، زاڕۆ.

**ئاینەمەل** (هەورا.): ئاهر مەلۆچ.

**ئایندە:** دوواڕۆژ، پاشەڕۆژ.

**ئایندەو ڕەوندە:** هاتووچۆکاران.

**ئاین و ئۆیین:** فڕوفیٚڵ.

**ئایوای:** ئەیهاوار، هەیهاوار، ئەیداد، وەیداد.

**ئـایهۆ:** هـایهۆ، هـەیهۆ، ئـەیهۆ، لـەکاتی باوەڕنـەکردن یـا تووڕەییـدا بەکاردەبریٚ.

**ئایهۆئایهۆ:** هەیهۆهەیهۆ، بڕوانە: ئایهۆ.

**ئایێ** (هەورا.): ئەوان. ـــ ویّشاواتشا: ئەوان خۆیان کوتیان.

**ئـایێ:** ئـای، ئـاخ، ئـۆی، ئـۆف، مرازێکـه لـەکاتی نەخۆشی، ئێش و ئـازار پێگەیشتنێدا بە کار دەبرێ.

**ئاییا:** پوور، خوشکی بـاوک، مـەت، میمـی، میمـک، پلـک. دایـک، دالْک.

**ئای یای** (موک.): جووره گۆرانییێکی کۆنی کوردییه.

**ئاییّر** (هەورا.): ئاگر، ئاوور، ئاڤر، ئاتر.

**ئاییرکوشن ئاژەر** (هەورا.): ئاوور کووژێنەوه.

**ئاییرگا** (هەورا.): ئاگردان، ئاوورگ.

**ئاییرگه** (هەورا.): ئاگردان.

**ئاییسـان:** داگیرسـان، داگیران (بـۆ چراوئـاوور)، داگیرسـیان (دەر.)، گیران، (هەورا.) هۆرگیران، ڤێکەتن.

**ئاییساندن:** ئاوور یا چرا هەڵکردن.

**ئاییساو:** ئاوور یا چرای داگیرساوه، داگیراو.

**ئاییسه:** ئەزۆک، ئاوەسوو.

**ئـایین:** چـەند فـەرمان و دەســتوورێکە لــە لایــەن خــوداوه بــەهۆی پێغەمبەرێکەوه بۆ ئادەمیزاد ناردرابێ. دیـن، ڕەفتـار، ڕەووشت، یاسا، کێش، هێنـان. بیٚ ـــ: بێ دین، سۆته، دووڕووزی، دلکۆچەر، ئـایینده، دواڕۆژ، پاشه ڕۆژ، لەمەودوا، لەمەوپاش، ئەوکەسەیه، کە دێت.

**ئایینه** (فه.): ئاوێنه، ئەینۆک. ـــ دار: ئاوێنەدار.

**ئایینەبەندی:** ئاوێنه بەندی.

**ئاییندار:** بەدین.ـــ ی: بەدینی.

**ئایینده:** دواڕۆژ، پاشەڕۆ

**ئایین و ڕەوەن:** هاتووچۆکار.

**ئایینی:** دینی، ئەنجومەنی ئایینی.

**ئـه:** ده، (باک.) د. نیشـانەیەکی ڕێزمانییـە، کـه بـه پێـش ڕەگـی کـاری ڕانـەبوردوو دەکـەوێت: ئـەچم: ئێسـتا وەیـا لـەمـەولا دەڕۆم. بـۆ: کـوردی کوتوویەتی:

ئه لای هەرکەس دەچم مەنعم دەکا خۆت بۆ چی ڕیسوا کرد
دریّغ کـــوا حالْزانیّ ڕەببی تووشم بێنی بیمـــاریّ

(سوور.) مرازی مێیینانه دەلێن: ئەو ئاوەدانه لـەمزگی خۆیدا، بۆ ئـافرەت بەکار دەبرێ. (باک.) بەلێ.

**ئەئا** (باک.): بۆمنداڵان بەکاردەبرێ تا پیسایی بکەن.

**ئەئاوا:** ئاوا، بەوشێوەیه، بەوجووره، بەوچەشنه.

**ئەئەوه:** ئەڤێها، ئەڤێهێ ئید.

**ئەئۆ:** هۆو: دەنگێکه وولاخی پیّ لیّ دەخوڕن.

**ئەئێرانه:** ئەئێره.

**ئەئێره:** ئەئێرانه، ئەئێگه، ئەچێگه، ئەڤێرێ.

**ئەبابۆز:** دز، جەرده، پیاوخراپ.

**ئەبابۆزی:** دزێتی، جەردەیی، پیاوخراپی.

**ئەبال:** ووتەیەکه بۆ پالْدان بەکاردێ، قسەی خراپ ئـەبالْ کـەس مـەده: قسەی خراپ وەپالْ کەس مەده.

**ئەبـەنووس:** ئابـەنووس لـە ئەبانووسی گیراوه دارێکه لـە هیندوستانی و حەبەشه وەکوو داره گوێزی گەورەو ئەستوور دەبیّ بەری وی وه ترێی زەرد دەچیّ گەلاْکانیشی وه هی سنەوبەریّ دەچیّ گولْیشی وەهی خەنـەی دەچیّ.

**ئەبد** (باک.): جووره گەنفێکه.

**ئەبدال:** سەوداسەر.

**ئەبرەش:** ئافرەت یا ئاژالْ یـا مـالاْتێکی مێیینەیـه، کـه لـەپاش زانی شیری ئەبیّ بیدا به بێچووەکەی، بیژوو، بیژەک.

**ئەبرۆ:** برۆ.

**ئەبلەق:** بازگ، بازەلـه، دووڕەنگ، بەلْەک، بازوو، چاوێکی داپچراوه، که تەماشای جێگایەکی تایبەتی ئـەکات، (بابا.) سوومس، (جا.) شیلْه، (هەورا.) باره، باری، دووڕەنگی پەلْەپەلْەییه به لەشەوه.

**ئەبلووقه:** ئابلوقه.

**ئەبلووقه:** گەمارۆدان، دەورەگرتن.

**ئەبووا:** دەبوو.

**ئەبووید** (ڕۆژ.): ئەسپیّ، مۆریان.

**ئەبیّ** (بابا.، ڕەوا.): دەبیّ.

**ئەبیال** (ئەرده.): پەتوو، جاجم.

**ئەپرەخ** (باک.): یاپراخ، دۆلْمه.

**ئەپلۆک** (که.): هەپلۆک، هەپلوک، قیزبەلـه، گیایەکه.

**ئەپۆلێت:** لەجلکدا پارچەیەکه لەسەر شان دەکرێتەوه، سەرقۆلْ.

**ئەپیّ** (باک.): ووشەییێکه بۆ خواردنی منداڵان بەکار دەبرێ.

**ئـەت** (موک.، ڕۆژ.): لیّدان، شێوەو زاراوەی منداڵانـه، بابـه ئـەت. ـــ کردن: لیّدان، (باک.) دێده یا خوشکی گەوره.

**ئەتا:** ئەوەتا، ئەوەتانیّ.

**ئەتانیّ:** ئەوەتانیّ.

**ئەتەر** (ئەرده.): نیشانه، بەلْگه، شوێن.

**ئەتەک** (فه.): پارزۆنگ، پالْووێنه.

**ئەتەگ:** بروانه: ئاتەگ.

**ئەترەش:** زراو، زات، زاوور، ئازایی. ـــ چوون: زۆرترسان و زراو چوون.

**ئەتفک** (باک.): هێشووی چکۆلْه.

**ئـەتک:** پـەند، دەکـن، ڕیســوایی، هــەتک. ـــ کـران: جنێوپێــدران، ئـابڕووبران. ـــ پێکران. ـــ کردن: ئـابڕووبردن، بەپەندبردن. ـــ پێکـردن. خوشکی چکۆلْه.

**ئەتلەس:** پارچەیـەکی جوان و بـه نرخـه. ئەخشەی جۆراوجۆری ووڵاتـانی خرکەی زەوییه.

**ئەتۆ:** تۆ، ته، (هەورا. کۆن) ئەوه. ـــ ش: تۆش، تەژی. ئەتوو، تۆ.

**ئەتوون:** ئارتوون، جەهەننەم.

**ئەچکاندن** (باک.): لە نێوبردن، پرووکاندن، ئەبووکردن.

**ئەچکین** (باک.): لەنێوبران، پرووکان، ئەبووکران.

**ئەجووڕێ** (باک.): جووره خەیارێکە، جووره هارووێکە. (ئەردە.) مرازی پرسیارە لە گەمەی ئەلەک دوولەکداو ئەوێتر دەڵێ: ئا جووڕێ.

**ئەجووزێ:** بڕوانە: ئەجووڕێ.

**ئەجێلۆسک** (باک.): بەرگ گۆڕین. خووە ـــ کرن.

**ئەڕچ** (لو.): لە.

**ئەچنەد** (لو.): ووتەییێکە بەکاردێنرێ بۆ پیشاندانی چتێک بە یەکێک لەسەر جۆرێکی تایبەتی.

**ئەحە:** کورتکراوەوەی ئەحمەدییە.

**ئەحنەرج** (زا.): دەنگێکە مەڕی پێ دەردەکرێ.

**ئەختە** (زا.): یەختە، خەساو، خەسیاگ. ـــ کردن: خەساندن، خەسانن.

**ئەختەر** (ژاوە.): ئەستێرە، (دەر.) ئەستارە، (هەو.) هەسارە.

**ئەختەر ژمار** (ژاوە.): (هەورا.) هەسارە ژمار. ـــ ی: هەسارە ژماری.

**ئەخترمە:** ووڵاخێکە لە شەڕێدا لە دوژمن گیرابێ.

**ئەخشاڵ:** پڕوپیتی ناوماڵ، زبڵ.

**ئەخڵەرخ** (ئەردە.): سیخمەی ژنانە، ژێرکەوا.

**ئەخم** (ئەردە.): نێوچاوان گرژی، ترشرویی.

**ئەخمکردن** (ئەردە.): نێوچاوان تێکنان.

**ئەخۆ:** ئۆخووەش (باک.)، ئۆخەیش.

**ئەخیاوان** (ئەردە.): شەقام، خەیاوان.

**ئەدا:** شێوە، ڕەفتار، جووڵان، خوو، ڕەووشت، لارولەنجە، (هەورا.) دایک، داک، بەڵان گەلێک کەس بە ئەدای دەخوێننەوە.

**ئەدابابا** (هەورا.): گوڵێکی سووری پەنجەپەنجەییە وەک پەنجەی دەستی.

**ئەداوەکردن** (ئەردە.): دووپاتکردنەوە.

**ئەدی:** بۆوەرام و ئاگاداری بەکاردەبرێ، ئەیی، ئەی، ما، جا، سا، ئەدی چ دەڵێ؟: ئەی چ ئێژێ، نیدی، نیتر، پەس، بابم بۆچ ناخوێنی نیتر(ئەدی)، بۆ پرسیار بەکاردەبرێ لە جیاتی (بەڵێ) ش بەکاردەبرێ وەکوو: تو دەخوێنی؟ ئەدی واتا بەڵێ.

**ئەدێ** (باک.): دایە، دایکە، دایکێ، کە منداڵ دایکی بدوێنێ بەکاری دەبا.

**ئەدی ئەدی:** ئەی ئەی، بەڵێ بەڵێ.

**ئەدەدی:** ووتەی سەرسووڕمانییە، لە وەڵامی کەسێکیشدا بەکار دەبرێ کەبڵێی ئازاد ناخوێنێ.

**ئەذا** (هەورا.): کرکی لە نێوانی (د ـ ذ)یدایە. دایک، دایە.

**ئەذوتاتە** (هەورا.): دایک و باوک.

**ئەذێ** (هەورا.): دایک و باوک، دایە.

**ئەر:** کورتکراوەوەی ناوی ئەردەلانە بۆ سەرچاوەکانی ئەم فەرهەنگە. تا (بۆ واقمانە). ئەگەر، گەر.

**ئەڕ** (باک.): مرازی سەر سووڕمانییە.

**ئەڕڕا** (لو.): مشار.

**ئەرا** (لو.): بۆ، لۆ، چرا. ئەرای چی: بۆچی، لۆچی. ئەرای کوێ دەچی: بۆکوێ دەچی؟.

**ئەرابە:** چەرخ، پێچکە، خرتک، گەردوونە.

**ئەراجووێ** (دەر.، فە.): بۆچی؟

**ئەراڕات:** بڕوانە: ئاراڕات.

**ئەراگێل** (هەورا.): شۆڤار، سەرگەردان.

**ئەرامەنە:** بڕوانە: ئەرامەند.

**ئەرامەند:** داماوی هەژار.

**ئەرانە** (کە.): خەزێم، لووتەوانە.

**ئەراوەند** (باک.): بەرز، بڵند.

**ئەرەب** (باک.): عەرەب.

**ئەرپڕەئەرپڕ** (کە.): زەڕەی کەرێ.

**ئەرەبەستە** (هەورا.): دابەستوو، دابەستە.

**ئەرەج** (ئەردە.): مەچەک، باسک.

**ئەرەجێ** (هەورا. کۆن): وێچوون، لێکردن.

**ئەرەجیا** (هەورا. کۆن): دەتزانی، دەتکوت.

**ئەرەقگیر:** ژێرزین، گومگومەییێکی لووداره گوڵاو ئارەقی پێدەگیرێ.

**ئەرەقچین:** ئارەقچن.

**ئەرەق** (باک.): ئارەق، مەی.

**ئەرەمەنەی** (هەورا.): ڕاوەستان.

**ئەرەمەدای** (هەورا.): ڕاوەستان.

**ئەرەمەرزای:** بڕوانە: ئەرەمەرزیای.

**ئەرەنیای** (هەورا.): دانان.

**ئەرەمەرزیای** (هەورا.): دامەزراندن.

**ئەرەنیشتەی** (هەورا.): دانیشتن.

**ئەرەووستەی** (هەورا.): دەرکەداخستن، بەرەداخستەی.

**ئەربەب:** خاوەند، یاران.

**ئەرەکۆتەی** (هەورا.): کەوتن.

**ئەربووش** (کە.): شێ، سوورهوڵ.

**ئەرتک** (کە.): هەتک.

**ئەرتی چۆک** (باک.): کەنگر.

**ئەرتووین:** شارێکی کوردانە لە باکووری کوردستانێدایە.

**ئەرەجیای** (هەورامی کۆن.): وازانین.

**ئەرخ** (باک.): قووڵکە، چاڵ.

**ئەرخاندن** (باک.): ماندووکردن.

**ئەرخەوان:** ئەرغەوان، دارێکە گوڵێکی سوور دێنێ گەڵایەکانیشی پانن.

**ئەرخە:** پشتیوان.

**ئەرخەوانی:** جووره ڕەنگێکە وەک ڕەنگی ئەرخەوان وایە، بنەوشەیی.

**ئەرخەوانی سوور:** کاتی سووربوونی ئەرخەوان لە بەهاردا.

**ئەرخەیان:** دڵنیا ، (باک.) قیمە. ـــ بوون: سەرگرین. ـــ کردن: سەرگراندن.

**ئەرخین** (باک.): ماندووبوون.

**ئەرخۆت:** لوورە لەپ، لوولەپی مەشکەی.

**ئەردەبێژ** (باک.): زەویناس، ئەردناس.

**ئەرد:** رۆژی (٢٥)ەمی هەموومانگێکی رۆژی (شەمسی)یە. هەرد، زەوی، ئەرز، خاک. ناموس، ئابروو، رق،قین، کین.

**ئەردە:** کورتکراوەی ناوی ئەردەلانە بۆ سەرچاوەی ئەم فەرهەنگە.

**ئەردەبێژی** (باک.): زەویناسی، ئەردناسی.

**ئەردەشێر:** رقی شێری، قینی شێری، دامەزرێنەری زنجیرەی شاهەنشایەتی ساسانیانە لە هۆزی شوانکارەی کورد هەڵکەوتووە.

**ئەردەک** (باک.): یەدەگ (وولاخ).

**ئەردەهان:** شارێکی کوردانە لەژێر دەستی ترکاندایە.

**ئەرز** (باک.): زەوی، خاک.

**ئەرزان:** هەرزان.

**ئەرزانجان:** هەرزانجان.

**ئەرزانی:** هەرزانی.

**ئەرزەرۆم:** عەرزەرۆم، باژارەکی کوردانە لەبن دەستی تورکاندایە، ئەردەرۆم.

**ئەرزەن** (باک.): چەنەگە، چەناگە، شارێکی وێرانی کوردستانە کەوتۆتە نێوانی وەلاتی (خەرزا و هەسکێف).

**ئەرزرۆم:** عەرزەرۆم.

**ئەرزن** (کە.): هەرزن.

**ئەرزناس:** ئەردەبێژ.

**ئەرزناسی:** ئەردەبێژی.

**ئەرزنوێت:** ئەرنەوت، ئەڵبانی.

**ئەرزنج** (فە.): ئانیشک.

**ئەرزنجان:** شارێکی کوردستانە لەژێر دەستی تورکاندایە.

**ئەرزنک** (باد.): چەنەگە.

**ئەرزنی** (باد.): جوورە هەنجیرێکە.

**ئەرزۆ** (باک.): ناوی ئافرەتانە.

**ئەرزێل** (باک.): هەرزاڵ، تەختی لەسەر نوستنێ.

**ئەرزینگ** (باک.، باد.، هەورا.): چەنەگە، چەناگە.

**ئەرژەنگ:** دێو، شەیتان.

**ئەرژەنگی دێو:** ناوێکە گیانداری زل و قەبەی ناشیرین و لەندەهۆری وێ دەچوێنن: دەڵێی ـــ یت.

**ئەرژن:** دارێکی بێ بەرە داردەست و گۆپاڵی لێ دروست دەکرێ.

**ئەرژنگ:** دارێکی بێ بەرە وەکوو داری ئەرخەوانی وایە.

**ئەرش:** عەرش.

**ئەرغەن:** ناوی شارێکی کوردانە لەژێر دەستی تورکاندا.

**ئەرغەوان:** ئەرخەوان.

**ئەرغەوانی سوور:** ئەرخەوانی سوور.

**ئەرغەوانی:** ئەرخەوانی.

**ئەرفای** (هەورا.): رفاندن، فراندن.

**ئەرفاز** (باک.): هەوراز، بڵندایی، تەپۆڵکە.

**ئەرک:** ئامرازی سەرسوورمانییە.

**ئەرک:** هەرک، کار، فەرمانی پڕئازار، رەنج، چرووسانەوە، ئازار، ماف، فەرمان، دەردەسەری، باری سەرشان، سەرجەنجاڵی. پڕ ـــ: پڕ رەنج و ئازار.

**ئەرک** (ئەرد.): دەربار، بارەگا.

**ئەرکدار:** کەسێکە یا فەرمانێکە ئەرکی زۆر بێ.

**ئەرکە:** کارێکی گرنگی مەبەست، کە بەکەسێکی بسپێرن. کووانوو، ئاگردان.

**ئەرمانای** (هەورا.): نیشاندان.

**ئەرمەغان:** کەونە شارێکی کوردانە لە کوێستانێدا.

**ئەرمەن:** هەرمەن.

**ئەرمەنستان:** هەرمەنستان.

**ئەرمەنی:** هەرمەنی.

**ئەرموود** (فە.): هەرمێ.

**ئەرمین:** ئەستێرەی قیبلەیە (جەدی).

**ئەرن** (باک.): رق، قین، کین. ـــ ا ڤی لێ چوو.

**ئەرناف** (باک.): رق، قین. ـــ لێچوو: رقی نیشتەوە.

**ئەرناندن** (باک.): ئەنراندن، زوویرکردن، ئازاردان، چرووساندنەوە.

**ئەرنەبووت** (فە.): مەیموون.

**ئەرنەمووتە:** قامکی نێوەڕاستێ، تیلا ناوەندێ، تیلکێ نیوەکێ، قامکی قوونێ، هەڵمەقووتە.

**ئەرنۆ** (باک.): رق ئەستوور.

**ئەرنین** (باک.): ئەنرین.

**ئەرۆ، هەرۆ** (باک.): مرازی بانگ کردنە بۆ نێرینانە.

**ئەرواز** (باک.): هەوراز، سەری کۆی.

**ئەروەند** (باک.): فێڵ و فەرەج و ساختە.

**ئەری:** ما، چما، چمان، ئایا، هەرێ، ئاخۆ، ئەیە، تۆبڵێی، کوورە، هۆی، هەر، بەڵێ. هێی: بۆبانگکردنیش بە کاردەبرێ، بۆواق و وورمان و پرسیار بە کار دەبرێ، لەجیاتی(بەڵێ) ش بەکاردەبرێ.

**ئەرێ. هەرێ** (باک.): مرازی بانگ کردنە و بۆ ژنانە.

**ئەریز:** پان و پۆڕو بەرین.

**ئەرێڤان:** ئێرەوان، رەوان، کە لەپێشدا کوردستان بوو ئێستا کوردەکان دەربەدەرکراوون و بۆتە پایتەختی هەرمەنیان.

**ئەرێن** (باک.): ئەرین. ئەرڕەی شێری. گەز بۆ پێوان.

**ئەرین** (باک.): بڕوانە: ئەرێن.

**ئەری و ئەرێ:** بەڵێ و مەڵێ.

**ئەز:** من ڕاناوی کەسی یەکەمی تاکە لە کۆمەڵەی ڕاناوی کارییی دایە (ئەز، تو، ئەو، ئەم، هون، ئەوان) لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ و تێنەپەڕدا رابووردووی تێنەپەڕیشدا بەکاردێت: ـــ دنڤیسم: من دەنووسم. ـــ دچم: من دەچم. ـــ چووم: من چووم.

**ئەزا** (باک.): ئازا.

**ئەزایی:** ئازایی.

**ئەزبە** (باک.): کاپسوول.

**ئەزبەر** (باک.): لەبەر، وانەکەی ئەزبەرکردووە واتا وانەکەی خۆی لەبەر کردووە.

**ئەزبەنی** (باک.): من بەندەم، منی بەندە.

**ئەزبۆلە:** هەزبێلە.

**ئەزبیە:** هەزبێ، هەزوا، چاترە، بەهاراتێکە لە نێو چێشتان دەکرێ.

**ئەزبێکێویلە:** هەزبیە کێڤیلە، نەعنای کێوی، جاترە.

**ئەزبێلە:** جاترە.

**ئەزحەیران** (باک.): من سەرگەردانت بم.

**ئەزدین زەری** (باک.): جۆرە پارچەیێکی باش و نرخدارە. جۆرە هەڵپەڕینێکە.

**ئەزغەنی:** شارێکی کوردانە لە ڕۆژاوای ژێری دیار بەکرێ.

**ئەزغولام** (باک.): بەندەی نۆکەر، بەندەی نۆکەر و کۆلەم.

**ئەزقوربان** (باک.): ئەمن قوربان، قوربانت بم.

**ئەزگۆری** (باک.): من قوربان، ئەمن قوربانت بم.

**ئەزمان** (باک.): ئاسمان. زمان، زبان، زوبان.

**ئەزمان ڕەش** (باک.): بەدگۆ، زمان پیس، پیس دووێن.

**ئەزمانی** (باک.): ئاسمانی.

**ئەزموون** (باک.): تاقیکردنەوە. بێ ئەزموو: تاقی کەوە. ئەزمووم: تاقیمکردەوە.

**ئەزمین** (باک.): تامکردن.

**ئەزوا:** (هەو.) هەزوا، تاڵی شاری (بۆ ڕەوانی باشە).

**ئەزویە:** هەزوای کێوی یا دەستچێن.

**ئەزێچ** (هەورا. کۆن): ئەو، لەو، منیش.

**ئەژ** (لو.): لە.

**ئەژدەر** (هەورا، باک.): هەژدیها، هەزیا، ئەژدیها (دەر.، ئەردە.) سەرەبەیداغ.

**ئەژدەها:** هەژدیها، عەفی(ئەردە.)، ماری زۆر گەورەیە.

**ئەژدیها** (دەر.): بڕوانە: ئەژدەها.

**ئەژمار:** هەژمار، ژمار، ژمێر، ژمێریار، هەڵژمار. بێ ـــ: بێ دەر، لە ئەژمار بەدەر، بێبژاردن، (باک.) بێدەر.

**ئەژمارە:** ژمارە.

**ئەژماردە:** ژماردە، بژاردە.

**ئەژماردن** (هەورا.): ژمارای، (فە.) شماردن، هەژماردن، هەژمارتن، ژمارتن، هەڵبژاردن، بۆ ـــ: بۆبژاردن، تۆڵە دانەوە.

**ئەژمەت** (دەر.، هەورا.): هەژمەت. تاو، رق، مەراق، تاوان، حەجمەت. لە ئەژمەتان چی بۆ نەکرا: لەتاوان چی بۆنەکرا.

**ئەژمێر:** ژمێر.

**ئەژمێراو:** ژمێراو.

**ئەژناس** (هەورا.): ناسیار، ناسیاو.

**ئەژنەفتن** (دەر.): بیستن.

**ئەژنەوا:** گوێ ڕایەڵ، ژنەوا، ڕام، فەرمانبەردار.

**ئەژنەوتن:** بیستن، گوێدان.

**ئەژنەویەی** (هەورا.): بیستن.

**ئەژنەوین:** بیستن.

**ئەژنۆ:** جومگەی نێوانی ڕان و لوولاکە، چۆک، ووژەنگ. (فە.) ڕەزانوو، رزانوو، (هەورا.)زەنگۆڵ، چمچ، (باک.) ئەژنوو، ژەنوو (شەوا.) زانی (ئەردە.، زەن.). زرانی، ووژنگ. لەسەر ـــ یان دانیشتن: قەلەفیسکانیشتن، قەلەقزکین، مێکانکی دانیشتن. بەئەژنۆی خۆدادان: سوولێ بوونەوە، پەرۆشبوون.

**ئەژنوو** (باک.): ئەژنۆ.

**ئەژنینەوە:** ئاژنینەوە.

**ئەژی** (ئاد.): مار.

**ئەژی:** دێنێ، ئەژێت، پێکەڵپێک، بەرانبەر، هاونرخە، دەژی، زیندەگانی دەکا.

**ئەس** (یە.): گەورەس، گەورەیە.

**ئەسان** (هەورا.): کڕیار.

**ئەسە** (ئێرە.): هەردەبێ، هەردەبێ بێ.

**ئەسای** (هەورا.): کڕین، وەرگرتن، سەندن (دەر.) ئەستاندن.

**ئەسەڵ** (ئەردە.): هۆ، مایە، بۆنە، گیاندارێکی نێرەی ماینییە بالای بەرزو ناو پشتی چاڵی داپێژراوی بەهێزە بۆ سوواری بەکاردەبەن.

**ئەسپ:** (دەر.، هەورا.) هەسپ، شەودێز، ڕەخت، ڕەخش، چاروا، نێرەی چارەوایە بۆ سوواری وبارو کشتوکاڵ بەکار دەبرێ. ـــی حدوود: ئەسپی هەرە باشترین. ـــ تاودان: (دەر.) ئەسپ پڕکردن. جۆرە دامەیێکە لە کەرستەی گەمەی شەترەنجێدا.

**ئەسپاردە:** سپاردە، تەلپ.

ئەسپ

**ئەسپاردن:** پێ ئەسپاردن، سپاردن، تەلپکردن، دانەدەست، بەدەستەوەدان، سپارتن، بازگورپبوون. بەخوا ـــ: بازگورێ خوەدێ بوون، پێ ئەسپاردن.

**ئەسپ ئەسن:** ئەسپا سنینە، بایسکل، ئەسپە دارینە، دووچەرخە.

**ئەسپ ئەسنینە:** ئەسپە دارینە، دووچەرخە، پایسکل.

**ئەسپ ئاهنین** (فە.): ئەسپە ئاسنینە.

ئەسپ ئاسن

**ئەسپەو** (ئەردە.): کەلوپەل، تفاق، ئامراز، هۆ، بۆنە، مایە.

**ئەسپایی:** هێواشی، هێدیێتی، بەکاوە خۆیی، هێپکانی، بە ـــ: بەهێواشی.

**ئەسپە** (هەورا.): گازوولکە. (ئەردە.) سووریژە، سۆرکە. ئەسپی زەرد، ئەسپی ڕەنگ زێڕین.

**ئەسپەئاسنینە:** بڕوانە: ئەسپ ئاسنینە.

**ئەسپەدارینە** (فە.): چەرەوەی ئاهنین، ئەسپاسنینە دووچەرخە، ئەسپێکیشە لەدار دروست دەکرێ منداڵان بۆ یاری سوواری دەبن.

**ئەسپەر** (لو.): سوپەر، مەتاڵ، (ئەردە.) ئەسپەرە.

**ئەسپەرە:** پارچە دارێکی نێوە ڕاست کونی دوو گوێییە لە دەسکی پێمەڕە دەخرێ و دەخزێنرێتە خوارێ، تا دەگاتە لوولەی پێمەڕەکە، کە بیانەوێ زەوی پێ هەڵکەنن پێ لە ئەسپەرەکە دادەگرن. مەدرەخە. ئەگریجە.

**ئەسپەرەدار:** پێمەڕەیەکە ئەسپەرەی هەبێ.

**ئەسپەرەم:** ڕێحانە، ڕیۆن.

**ئەسپەردە:** سپاردراو، ئەسپێردراو، سپاردە، سپێرپاگ.

**ئەسپەردەکردن:** سپاردن، سپەردەکردن.

**ئەسپەردن:** سپاردن.

**ئەسپەڕێز:** ماوایەکە، کە سووارتێیدا لنگ بدات. ناوی دێیەکیشە لەهەوراماندا.

**ئەسپەژن** (ڕەوا.): ژنێکی کۆک و پوختە و باڵابەرزو شۆخە.

**ئەسپە شینە:** باڵندەیێکی ڕەنگاوڕەنگە لە کەڕەواڵە گەورەترە، لەکاتی فڕینێدا دەنگێکی لێوەدێ وەحیلەی ئەسپی دەچێ.

**ئەسپەک:** نێوی دەردو ئازارێکییە، (هەورا.) ئەسپەنەک، نەخۆشی گرانە تادار کە لێی گۆڕی و لە کاتی ئارەقەدا لە سەری بدا شێتی دەکا، یا بێ مێشکی دەکات و دەزریکێنی. ماکی سووریژەیە. ناوی گیایەکیشە لە گوڵەکەی بە ئاوەوە بدرێ بە ڕەشەگرانەتادار زۆر سوودی لێدەبینێ. گیایەکیشە وەکوو نێرگسی وایە لە سەری ئەسپەکداری دەنرێ بە کوتراوی بۆ ئەوەی بە هۆی گرانەتا (تیفۆ) و ژانەسەری نەمێنێ.

**ئەسپەمار** (هەورا.): توولەمار، تیرەمار.

**ئەسپەناخ:** ئەسپیناغ، ئەسپەناغ، سپێناخ، سپەناخ. (باد.) جوورە سەوزییەکە چێشتی پێلێدەنرێ.

**ئەسپەنەر** (کە.): ئەسپەندەر.

**ئەسپەنەک:** بڕوانە: ئەسپەک.

**ئەسپەندەر:** ئەسپەنەر.

**ئەسپ باری:** یەکسمی باری، ئەسپی باری.

**ئەسپی چەپەرخانە:** ئەسپی پۆستەخانە.

**ئەسپدز:** کەسێکە ئەسپی بدزێ.

**ئەسپ دووڕەگ:** ئەسپی خەساو، بارگین.

**ئەسپڕەس:** مەیدان.

**ئەسپرزە** (ئەردە.): کەپەک.

**ئەسپ ڕێز:** ماوەییکە، کە ئەسپ بەغارێکی بیگاتێ.

**ئەسپ سوواری:** ئەسپێکە لەکارو سوواری دەرهاتبێ.

**ئەسپنگ:** (باد.، باک.) سپنگ، سپندک. (سەق.، هەورا.) شنگ. ــ چەندجوورە: ئەسپنگی بەنێ: ئی کێوانە. ــ زەویان: ئی زەویانە. ــ ماینە: ئی تەڕازنانە.

**ئەسپوول** (هەورا.): سپڵ.

**ئەسپۆن** (ڕۆژ.): گرۆکە، (هەورا.) چۆغان، زرۆی. بنەگیایەکە بە وورد کراوی بۆ جل شوشتنێ بەکاردەبرێ، ئەسپۆن لەم سێ گیایانە پەیدادەبێ: گلۆک، تێسوو، کافوور، بۆ ژانی زگ و کەلەکەو جێگایانیتر تێکەڵ بە ئاوی سارد دەکرێ و شەوێکی لەبەر سایەقەی دادەنرێ و بەیانی لە خورێنی بخورێتەوە زۆر بەسوودە بۆ تا، بەسیریش لەگەڵ زەردێنە هێلکەو خورێنی کوێستانێ دەکرێتە شاف زۆر باشە، لەشی خرووداروو خارشتداریشی پێ بشۆرێ گەلێک سوودی لێدیتراوە.

**ئەسپ هیلنۆ یا حیلنۆ** (هەورا.): ئەسپ دەحیلێنێ.

**ئەسپێ** (باک.): سپەه، سپە، سپەهک، سپی، (زەن.، هەورا.) هەسپێ، سپێ هەشیش، ئەبووێد، عەبووێژ (فە.) هەشپشی، شش، مۆرانەییێکی بچووکی جەنگاوی بە ئالۆشە بە لەشی مرۆڤان هەلدەگەڕێ.

**ئەسپی ئاهنین** (فە.): دووچەرخە، ئەسپە دارینە.

**ئەسپی دار:** ئەسپیدار، سپیدار، چنار.

**ئەسپێردران:** بڕوانە: ئەسپێر.

**ئەسپێردراو:** بڕوانە: ئەسپێر.

**ئەسپێران:** ئەسپێردران، سپاردران، سپێردران، ئەسپێرراو: سپاردراو، ئەسپێردراو، ئەسپەردە.

**ئەسپێ کوژە:** قامکە گەورەیە.

**ئەسپیندار:** جوورە چنارێکە، سپیدار، سپیندار، ئەسپیندار لەگەڵ شاتانی یەک کۆزن، بەڵان لکی بڵاو دەبێ و قەدی تاکتاکەشیان خووار دەبێ، گەڵایەکانی وەهی شاتووی دەچێ بەڵان گچکەترە و کەسک دەنوێنی چونکووگەڵای تووی ڕەش کەسکێکە ڕەش دەنوێنی.

**ئەسپێوون** (هەورا.): هەسپێوون، کەسێکە زۆر ئەسپێی پێوەبێ.

**ئەسپێی بزن و مریشکان:** کەوەیی.

**ئەسپێی مریشکان:** کەپلە.

**ئەست** (دەر.): یە، ئەس: گەورەست: گەورەیە.

**ئەستار:** ئەستەر.

**ئەستارە:** ئەستێرە.

**ئەستان** (کە.): هەستان، بەردێکی ڕوولووسە تیغی پێ تیژ دەکرێ.

**ئەستاندن:** (هەورا.) ستاندن، ئەسای، (دەر.)سەندن، (کە.) سەنن.

**ئەستاندنەوە:** ستاندنەوە.

**ئەستەر** (هەو.): بەری کەوا، ئەستاڕ، (هەورا.) بەتانە، (باک.) بەتان.

**ئەستەڕک:** (دەر.) هەرزاڵە، هەرزاڵ، پێڕک، جوورە هەرزاڵێکە لە سەر چووار کۆڵەکەی کوورت دارە ڕا دەکرێ و لە گوندانداا کەل و پەلی لەسەر دادەنرێ.

**ئەستوور:** (هەو.) ئەستاوور. ئەستێوور.

**ئەستر** (کە.): ئێستر.

**ئەستڕان:** سڕان.

**ئەستڕاو:** سڕاو.

**ئەستڕی** (زا.): دڕک، زی، دڕووداڵ. دارێکی دڕواوییە دوو بەژن بڵند دەبێ و گوڵی وەکوو خەزێی وایە.

**ئەستڕی زەردکە:** بە شێنی گیایەکی زۆر زەردو جوانە بەوشکی دەبێتە دروومزەردە، دڕکە زەردە.

**ئەستریشک:** سرێشک.

**ئەستریلک** (خۆ.): چرێش، سرێش.

**ئەستڕین:** (دەر.) سڕینەوە، سڕاندنەوە، سڕین، ئەستڕین.

**ئەستڕینەوە:** کووژاندنەوە، سڕاندنەوە، تێکدان، سڕینەوە.

**ئەستنگ:** چزووی دووپشک و زەردەواڵە و هەنگ و نیشتر، پلەی شاخ.

**ئەستۆ:** مل، گەردن، سکوور، سکوورت، سکوورد، ستۆ، ستۆهـ، پشت ئەستۆ: پژمل، ئەستووراییی مل، لەئەستۆی تۆیە: لەملی تۆیە واتا تۆ بەرپرسیاری.

**ئەستوور** (باک.): ستوور، ستوورکوور، ستۆکوور، تیر، قەوی، قانج، هەقەتی، (کەل.، لو.، هەورا.) کلّفت، کوڵوفت. کانە، چتێکە تەنک نەبێ.

**ئەستووران:** لۆکەو خورییە کە ئەستوور ڕێسرابێ.

**ئەستوورایی:** پۆزایی، ڕاستی ئەستووراییی چتێکی.

**ئەستوورک:** کوللێرەی نانی، (فە.) پەپک.

**ئەستوورکە:** کوللێرەی نانی.

**ئەستووری:** ستووری، ئەستوورایی.

**ئەستۆک:** ئەستۆ.

**ئەستووک** (کۆ.): کوللێرە.

**ئەستوون** (شار.): بڕوانە: ئەستوندە.

**ئەشتوونە زێڕینە:** کۆلکە زێڕینە، پەلکە زێڕینە.

**ئەستوندە:** کۆڵەکە، (باک.) ستوند، (دەر.) هوستون، کۆڵەکەی ڕەشماڵانە، ستوون، کۆڵەکەی دەواران، ئەستونک، ئەوەی ئەستوور و بڵندە لە نێوەڕاستی خێوەتان هەڵدەدرێ.

**ئەستوندە زێڕینە:** کۆلکە زێڕینە.

**ئەستوندەکە** (ڕەوا.): کۆڵەکەی نێوە ڕاستی خێوەتانە، خێوەت بریتییە لە: ستوندی ڕەشماڵان، ڕەشماڵ، ڕستە، چیغ، سینگ.

**ئەستونگ:** بڕوانە: ئەستوندە.

**ئەستوونەک:** ئەستوندە.

**ئەستێ:** پارچە ئاسنێکی کەوانەدارە بەردەستێیەکی تایبەتی هەیە پووشووی لە سەر دادەنێن، کە ئەستێیەکەیان یەکدوجار یا پتر لە بەردەکەی دا پووشووەکە ئاوور دەگری، جاران ئەستێ و بەرد لەجیاتی لێخرێنە(شخارتە)ی بوو، چەخماخ.

**ئەستی** (باک.): نێوی نافرەتانە، ستی. لە زمانی خووریدا (ئەشتی ـ ئەژتی) واتای (ژن) دەبەخشێت.

**ئەستێر:** ستێر، پوورکە، ڕفکە (حەوز)، (شار.) ئەستێل. ئەستێرک، هەساری، گۆلی ئاوی، بەندلو، ستێل. نێوی نافرەتانە. (دەر.، دزە.، باد.) فرمێسک.

**ئەستێرە:** هەستارە، چتارە، ستێر، (زمن.) هەسارە ئەختەر، هەرین، ئاسیرە، ئەو چتە ڕووناکانەن، کە شەوانە بە حەواوە دەدرەوشێنەوە. نێوی نافرەتانە.

ئەستێرە

**ئەستێرەژمێر:** ئەستێرەناس. جوورە مووروویەکی سوورکاری بریسکە دارە وەک ئەستێرە جریوەی دێ، ژنان لە زێڕو زێوی دەگرن و لە ملیانی دەکەن.

**ئەستێرەی سۆرک** (بار.): ئەستێرەیەکی سوورەو هەمیشە دیارە.

**ئەستێرەی بەیانی:** (زمن.) هەسارەی ڕۆژ، ئەستێرەی ڕۆژێ.

**ئەستێرەی جری:** (فە.) ئاسیرەی جری، گوونەستێرە.

**ئەستێرەی ڕۆژێ:** (زمن.) هەسارەی ڕۆژ، ئەستێرەی بارام (مەریخ).

**ئەستێرەی سیوەیل:** (باک.) پەرەک.

**ئەستێرە شەلە:** جوورە ئەستێرەیەکی کزە لە تەنیشت ئەستێرەی ناوەڕاستی دووەمی کلکی حەوتەوانانە.

**ئەستێرە شوناس:** زانای ئەستێرەناس.

**ئەستێرە ناس:** هەسارە ژمار، ئەختەر ژمار، ئەستێرە ژمار، ئەستارە ژمار.

**ئەستێر ناسی:** هەسارە ژماری، ئەستێرە ژماری.

**ئەستێرەی قوبلە:** مەگەنی ئەزمین، دەغدان، دەغدغان.

**ئەستێرەی کاروانکوژە:** بڕوانە: کاروانکوژە.

**ئەستێرەی کلکدار:** (فە.) ئاسیرە دمدار.

ئەستێرەی کلکدار

**ئەستێرۆک:** ئەستێل.

**ئەستێرەیی:** ستێریینی.

**ئەستێرک** (کە.): هەرزاڵێکە لە ناوماڵدا دروست دەکرێ بۆ ئەوەی دانەوێڵەی لەسەرەوەو ژێرییەوە دانێن، (خۆ.) حەوز، گۆل، ڕفکە، (شار.) برک، ئەستێر، ئەستێل، شووقەللەت، ئەستێرکە.

**ئەستێرک:** بڕوانە: ئەستێرک.

**ئەستێرکە:** بڕوانە: ئەستێرک.

**ئەستێل** (بابا.): گۆل، ئەستێر.

**ئەستێلە باخەڵ:** جوورە گەمەیێکی خاکی بابانە.

**ئەستێلک:** بڕوانە: ئەستێوولک.

**ئەستیم:** بڕوانە: ئەستێوولک.

**ئەستیو** (کۆ.): خاکەندازی پیسایی و زبڵ پێ فڕێدانێ، بەهی گڵ فڕێدانیش دەڵێن، بێڵی ئاسن، (هەو.) ئەستێوولک، (ڕەوا.، بابا.) خاکەنازی ئاگری.

**ئەستی و بەرد:** لە ئەستێدا بیدۆزەوە.

**ئەستێوور:** (هەو.) قسر، ئەستەویر، (شک.) ستەوور، ستێوور، کۆندز، کە شیری بدات، (شەق.، ڕەوا.) کەندز، (باک.) بەربووار، ئاژاڵ، ڕەشە وولاغ، یا ماینێکە ساڵێکی نەزابێ.

**ئەستێوولک:** (دەر.) ئەستیم، (هەورا.) ئەستیو، (بابا.) ئەستیلک، ئەستێولک، ئاسنێکی دەم پانی کلک درێژە هەویری ووشک هەڵگەڕاوی لە تەبەک و کوول و پنە و ئیتر پێ دەکرێنرێ.

**ئەشتیها** (هەورا.): ئیشتیا، مگێز.

**ئەسر** (زمن.، فە.): فرمێسک.

**ئیشتیهاکەردەیوۆر** (هەورا.): ئیشتیا کەرەوە.

**ئەسرار** (باک.): تریاک.

**ئەسرارکێش:** تریاککێش. ـــ ی: تریاککێشی.
**ئەسرەمۆک:** گلێرە، (دەر.) بنگرەگ، گژنیژە، (هەورا.) بەفرئالوکە. چتێکی خڕە پێش بەفری دەبارێ.
**ئەسرەمووک** (کۆ.): ئاڵ و بۆڵ، ترێ یەکە لە نێوانی ترێ و قۆرەیدا بێ.
**ئەسرۆچڵک** (باڵک.): کەڵە شاخی ڕۆنی سەپانانە.
**ئەسرۆلک** (شار.): کەڵە شاخی ڕۆنی سەپانانە.
**ئەسرێلک** (کۆ.، کە.): چرێش، ئەستریلک، سرێش.
**ئەسرین:** ئەسترین.
**ئەسرین:** فرمێسک، (فە.) چاوبە فرمێسکەوە.
**ئەسکەلە:** بەندەر.
**ئەسکەری:** جوورە ترێیەکە.
**ئەسکەملە:** جوورە کورسییێکی یەککەسییە، جوورە یارییەکیشە یاری ئەسکەملی پێدەڵێن.
**ئەسکەنە** (بابا.): مەکارە، ئاسنێکی دەم تیژە دارتاشان داری پێ هەڵدەکەنن یا قوڵی دەکەن.
**ئەسکەنج:** ئەشکەنجە.
**ئەسکەنجەبین:** جوورە خۆشاوێکی ترشە لە ئاوی ترێی دروستدەکرێ.
**ئەسکڵ** (داو.، زەن.، جەبا.): پۆڵووی ئاووری، (هەورا.) نێک، نێسکەکەی سەرەوەی ڕانییە.
**ئەسکنجە:** زیزەڵە، قوڵقوڵە، نێک، (بانە.) ئەسکەنج، نێسکەکەی سەرەوەی ڕانییە لە خووارەوەی کەلەکە.
**ئەسکوو** (باک.): (دەر.) لە کووێیە، هالە کوورە، (هەورا.) چکۆن. ئەسکووێ.
**ئەسکوداری:** جوورە سەروپێچێکە، کە کوردە دیلەکانی ژێر دەستی ترکان لە سەری دەنێن.
**ئەسکولند:** (کۆ.) ئەشقونج، کە جگ لە هەلاویژتنێدا بکەوێتە سەر دورنووکەکانی سەری یا قوونی، ئەسکولندە، ئەسکوندە.
**ئەسکوندە:** جگ لە هەلاویژتنێدا بکەوێتە سەر دورنووکەکانی لای سەری یا قوونی، ئەسکوندی پێدەڵێن، ئەسکولند، ئەشقونج.
**ئەسکووێ:** (هەورا.) ئەسکوو، کوودە، (ئەردە.) هەسکۆ، هەسک، کەوچێز، (باک.) باتک. کەوگێز. کەوچکێکی گەورەی دەم زلی کلک درێژە چێشتی شلەی لەمەنجەڵێدا پێ تێکوەردەدرێ و تێدەکرێ و بەقالانیش بەکاری دەبەن.
**ئەسمەرپێچ:** چیغێکی تایبەتی بەبەنی ڕەنگاو ڕەنگ چنرابێ.
**ئەسمین** (باک.): یاسەمەنە.
**ئەسکێف** (حسن کیف): شارێکی کوردانە لەسەر رووباری دەجلە کەوتۆتە ڕۆژاوای جزیرو بۆتانێوە.
**ئەسوور:** سەبزی، سەوزەوات.
**ئەسید** (باک.): شیرنیاتێکە و هەڵوایەکە لە دۆشاو و نیشاستە دروستدەکرێ.
**ئەسیدە** (باک.): چێشتێکە لە برنج و سەوزەوات و گۆشت دروستدەکرێ.
**ئەشەبۆ** (هەورا.): گیایەکی بۆنخۆشە.
**ئەشها** (کە.): چاکتر، بەرزتر.
**ئەشت** (خۆ.): چت، چتمەک.
**ئەشتەبا** (ڕەوا.): هیچ، هیچ چتێک.
**ئەشتر** (خۆ.): شەتڵ، بۆ چەقاندن.
**ئەشخاڵ:** بڕوانە: ئەخشاڵ.
**ئەشرمە** (نە.): کەپۆبڕاو.
**ئەشرەفی:** جوورە دراوێکی زێڕینی گچکەیە دەکرێ بە پرپەرەی چەند جوورە خشڵێکی ژنان، جوورە گوڵێکیشە وەکوو گوڵەباخ وایە بەلام ئەم بۆنی کەمترو گەلێک ڕەنگی هەیە.
**ئەشقەمە:** وورگی ئاژالانە، کە هێشتا پیسایی لێ فڕێ نەدرابێ.
**ئەشقونج** (کۆ.): ئەسکوندە.
**ئەشقەمە مەسای:** وورگ ئاوسان.
**ئەشک** (خۆ.): لە ناوگۆڕدا لە هەردووک تەنیشتی دووبەردی تەنک و درێژ دادەنرێ و دوو بەردیش لەلای سەری و لاقی لە نێو بەردەکان دادەنرێ تا نەلەقن. پەلە بەردێکە بخرێتە نێوانی دووبەردی لەق تا قاییمیان بکات لە ناو دیوارو ئیتردا، (هەو.، شن.) چەرمی ژێر زگی وولاخانە، (دەر.) لوولاکی وولاخی بەرزەو گوێدرێژانە، (فە.) فرمێسک.
**ئەشکەپووز:** گورگە: دێوەزمە، ووشەیێکە بۆ ترساندنی مندالان بەکاردەبرێ دەڵێن: ـــ بیگرە، یا مەچۆ وێ ـــ ی لێیە.
**ئەشکەپۆمی** (هەورا.): قۆڕ، قیرە، گونک، دەبە، دەبەگون.
**ئەشکەر** (باک.): ئاشکرا.
**ئەشکەفت:** ئەشکەوت، غار.
**ئەشکەفتە** (ڕەوا.): نەزان، نادان، گێل.
**ئەشکەڵە:** ئازار، ڕەنج.
**ئەشکەفک** (باد.): شکەفک، تەبەک هی دارە بۆ هەویری.
**ئەشکەڵە:** قوڵفەکانی دەوارە، کە تێکدەخرێن و داریان لێ قایم دەکرێ و لێک دەبەسترێن، جێوجەڵە، ئەشکەنجە، دارێکی باریکی بەقەد پەنجەیە وولاخانی پێ جەلە دەکەن.
**ئەشکەلک:** سووالەت، پارچە سووالەتێکە زبڵ و چتی پێ فڕێدەدرێ، ئەشکەولەت.
**ئەشکەمدوڕیدە:** شکەمدوڕیدە.
**ئەشکەنە** (باک.): چێشتێکە بەگەغی لێدەنرێ.
**ئەشکەنجە** (ئەردە.): شکەنجە.
**ئەشکەو** (خۆ.، دز.، شن.، بار.): تەبەکی داری هەویری.
**ئەشکەوت:** کۆڤ، کوونەرەخ، زایەند، غولۆلیف، غار، خار، زاخوور، کاو، (دەر.) کەووڕ، (کە.، هەورا.) شکەفت، کەوڕک، مەڕ، ئەشکەوتێکی زستانێ تێیدا دادەنیشن پێی دەڵێن زڤنک.
**ئەشکەنجە:** جەرومەنگەنەی بەرگسازان، ئازار، تالاو، چەرمەسەری.
**ئەشکەولەت:** بڕوانە: ئەشکەلک.
**ئەشکول:** پشکوڵ، پشتیوانی دەرگا.
**ئەشکێڕک** (ڕەوا.): شلکێنە.

**ئەشکنج:** چۆلایی لای ڕاست و چەپی بەر مووسڵدانێیە .

**ئەشکنجە:** ئاسنێکی درێژە ئاسنێکی پێچ پێچی بەسەرەکەیەوەیە دەرگاو پەنجەرەوهێندێ شتی تری پێش داکوتانێ تێدەخرێ ولێی توند دەکرێ بۆ جووتبوونی ئەنجا لە ناویدا دەکوترێ.

**ئەشکێڵ:** سەمەندۆک، کۆکان، (هەورا.) شکێڵ، ڕاست و چەپ، بەو زنجیرەش دەڵێن، کە سەگی پێ دەبەستنەوە، بەستنەوەی دەستێک و پاشوێکی یا هەردووک دەستی وڵاخییە، چووار پەلبەستنی وڵاخ و بەزەویداخستنی، (هەورا.) دار وە پشت دەرکەی دان و قایمکردنی، پشکۆڵ، پەند پێکردن، ئازاردان، ڕیسواکردن، پێوەندو قوڵفەی خێوەتانە.

**ئەشکیل** (ئەردە.): پاوەن.

**ئەشکێلە:** شلکێنە.

**ئەشکێڵکە:** نانێکە لە بەر خراپی ئارد وەکوو شلکێنە بە شلی لەسەر ساجی ڕودەکرێ، (باڵەکان.) شلکێنە.

**ئەشکیلۆک:** (باک.) تێکوڵی گوێزییە، (بابا.) تۆکڵ، قاپێلک.

**ئەشم** (کە.): گوێدرێژی کەوە، کەری ڕەنگشین.

**ئەشناس:** ئاشنا، دۆست.

**ئەشناسای** (هەورا.): ناسین.

**ئەشناسنای** (هەورا.): پەناسیندان، ناساندن.

**ئەشنە** (باک.): گێوورژ.

**ئەشێ** (جا.): دەبێ، شایانە، دروستە، (هەورا.) مشیۆ، (دەر.) دبووک، ئەم کارە لە بووانە یا نابێ؟.

**ئەشیا:** دەبوو، دەبووا، مەشیا.

**ئەشێف** (باک.): بژار، گیای خراو.

**ئەغز:** داگیرکردنی چتێک لە یەکێک، زەوتکردن.

**ئەغزە:** قونچکە جگەرە، قونچکە جغارە.

**ئەفارە**(باک.): هێشووکەر، گوڵ هەڵگرەوە.

**ئەفەجان** (باک.): شلوورقکەر، شلوورقیکار.

**ئەفەرۆز** (باک.): ئافەرۆز، بێشەرم و بێبەهرە، دوورخراوەوە، دەرکراو. ــ کرن: بێشەرم و بێبەهرەکردن، دەرکردن.

**ئەفتار** (باک.): کەمتیار.

**ئەفتەو** (فە.): ڕۆژ، خۆر.

**ئەفتەو بەر** (فە.): سەیوان، چەتری هاوین و زستانان.

**ئەفچکاندن** (باک.): جیقدەرهێنان.

**ئەفچکین** (باک.): جیقدەرهاتن.

**ئەفراسیاب:** نێوی پیاوییە.

**ئەفریی** (باک.): هێلمی ماسی، چەسپی ماسی.

**ئەفریقا:** کەرتەی ئەفریکا.

**ئەفریقایی:** ئەو کەسەیە، یا ئەو شتەیە، کە بەندیواری بە کەرتەی ئەفریکاوە هەیە.

**ئەفسانە:** چیرۆک و بەسەرهاتی پڕوپووچ.

**ئەفسووس:** داخ و پەرۆش و خەفەت، ووتەی دەربڕینی پەژارەو پەرۆش.

**ئەفسوون:** جادوو، نشتوو، ئەفسانە، چاوبەندی، چاوبەستی، تەلەسم.ــ کردن: جادووکردن.

**ئەفسوونباز:** جادووگەر، نشتوونووس. ــ گەر: جادووباز، کووڵەنانی.

**ئەفسوونگەری:** جادووگەری، سیحربازی.

**ئەفشار:** ناوی جوورە مەقامێکییە.

**ئەفغان:** ئەو کەسەیە، کە لە ئەفغانستان دەژی.

**ئەفغانستان:** وڵاتی ئەفغانانە، کە کەوتۆتە بەری ڕۆژ هەڵاتی ئێران.

**ئەفغانی:** کەسێکە یاشتێکە، کە بەندیواری بە ئەفغانەوە هەیە.

**ئەڤ** (باک.): ئەو، ئەم، مرازی ڕیکە بۆ یەکێکی تەنهاو نزیک یا بۆ چتێکی نزیکە. جێناوی نیشانەیە، بۆ نێزیک. ڤی: بۆنزیک و نێرینانە. ڤێ: بۆنزیک و مێینانە. وەکوو: ڤی خار، ڤێ خاریە (ئەو خواردی). وی: بۆ دوور و نێرینانە. وێ: بۆ دوور و مێینانە، وەکوو: وی گۆت، وێ گۆت (ئەو گوتی). ئەو: بۆ نیشاندانی کەس یا مالات و زیندەوار یاچتێکی دوور بە کار دەبرێت.

**ئەڤان** (باک.): ئەوان.

**ئەڤانە** (باک.): ئەوانە.

**ئەڤە** (باک.): ئەوە.

**ئەڤە ڤە** (باک.): ئەوەتا.

**ئەڤەندە** (باک.): ئەوەندە، هێندە.

**ئەڤچەند** (باک.): ئەوەندە، هەند، هێندە.

**ئەڤدال** (باک.): ئەودال، ئەبدال، دێوانە، سەوداسەر. ــ ی: ئەودالی، سەوداسەری.

**ئەڤدین** (باک.): تۆڵە. ــ اخوە ستاندن: تۆڵەی خۆلێکردنەوە.

**ئەڤڕا:** بەرز، بڵند.

**ئەڤڕاختن**(باک.): هاندان، پێهەڵکوتن.

**ئەڤراز** (باک.): هەوراز.

**ئەڤراندن** (باک.): دروستکردن، لە نەبوونەوە پەیداکردن. ــ ا دنیایێ، داهێنانی دونیایێ.

**ئەڤڕەنگ** (باک.): بەو ڕەنگە، بەو چەشنە.

**ئەڤڕست** (باک.): جوورە دارە عەرعەرێکە، بڕوانە: هەڤڕست، ئێرڤست.

**ئەڤڕۆ:** ئەمڕۆ، هەڤڕۆ.

**ئەڤشی:** هەڤشی حەوشێکە لە پەرژین و چەپەران دروست دەکرێ بۆ مالات و ئاژاڵی تێدەکرێ.

**ئەڤقا** (باک.): هێندە، ئەوەندە.

**ئەڤک** (باک.): میتکە، قیتکە.

**ئەڤۆر** (باک.): نێریە کێوی.

**ئەڤهندە** (باک.): هێندە، ئەوەندە.

**ئەڤی** (باک.): ئەوەی.

**ئەڤێرێ** (زا.): ئێرە، ئەئێرە.

**ئەڤین** (باک.): خۆشەویستی، دڵدارێتی. ــ ی: هەڤینی، (باک.) ڤین، سەودا، خۆشەویستی، دڵدارێتی.

**ئەڤیندار:** سەوداسەر، دڵدار. ـــ ی: سەوداسەری، دڵداری.

**ئەڤێها** (باک.): ئەمەوە مرازی نیشانەیە بۆ یەکێکی نزیک.

**ئەڤێهنێ** (باک.): مرازێکی نیشانەیە بۆ یەک یا دوو یا زۆرتران. (باک.): ئەمەوە.

**ئەقار** (باک.): زەوییەکە داری لێ چەقابێ.

**ئەقفی** (باک.): خەنجەرێکی گچکەڵەیە لەپشتەوە هەڵدەگیرێ.

**ئەقیق** (باک.): ئاقیق، عەقیق.

**ئەک:** دەک، ئەها، ئاها، بۆ ئاگاداركردنەوە بەكاردەبرێ و جارجاریش بۆ پەرۆشە.

**ئەک ئەک** (کە.): ئەهائەها، ئاها، ئاگاداربە.

**ئەکسیر:** نایاب، کەم هەڵکەوتوو.

**ئەککوو:** ئەک، دەک.

**ئەکوان:** دێوان، دێوەگەل.

**ئەکید** (باک.): گەورەگەورە.

**ئەکاڵ:** بروانە: حەکاڵ.

**ئەگە:** ئەگەر.

**ئەگەر:** گەر، کە، خۆ، ئەگە، هەکە، ئەر. مرازی بەندیواری و مەرجە وەکوو: ئەگەر بێیە لام منیش نامەت بۆ دەنووسم، (باد.) هۆ، بۆنە، پەڵپ، گرێ، قۆورت، تەگەرە، دڵۆ.

**ئەگەربۆ** (هەورا.): ئەگەربێتوو، بێتوو.

**ئەگەرچی:** هەرچەند، هەگەرچی (دەر.) ئەگەر چووێ، هەرچەنە، ئەرچی، هەرچەن.

**ئەگەرنە:** دەنا، ئەرنە، وەرنە.

**ئەگەرێ** (جا.): لەبەر.

**ئەگرە** (جا.): نێرە.

**ئەگرەنە** (ئەردە.): نێرە.

**ئەگرەیی** (ئەردە.): نێرەیی.

**ئەگریجە:** ئەو لزگە موونانە، کە دووای برانەوەی لەسەر ناوچاوان ڕادەوەستێ لە لای هێندێکیانیش ئەوموونانەی سەری نافرەتانە، کە لەسەر ڕوومەتەکانی ڕادەوەستن، (شا.، کە.) جخ. تیتک.

**ئەگید** (هەورا.، باک.): ئازا، پردڵ، ئەبەز. ـــ ی: ئازایەتی.

**ئەگین:** ئەگینا.

**ئەگینا** (بابا.): دەنا، ووشەیێکە لەنێوانی دوو ڕستاندا بەکار دێنرێ وا دیار دەکات، کە ڕستەی دووەم ڕستەی یەکەم پووچ دەکاتەوە، وەکوو: تۆ ئەم ڕۆژنامەیە بخوێنەوە دەنا (ئەگینا) من خۆم دەیخوێنمەوە واتا: کە تۆ نەیخوێنیەوە من دەیخوێنمەوە تۆ لێرە دانیشە، ئەگینا من دادەنیشم. واتە. کە تۆ دانەنیشی من دادەنیشم.

**ئەگینە:** ئەگینا.

**ئەلاجکەر** (ئەلاجگر): شارێکی کوردستان و بەناوبانگە، کەوتۆتە دەشتی (خنووسێ)وە.

**ئەلالەت:** دەستە، کۆمەڵە.

**ئەلامەت** (هەورا.): هەلامەت، پەسیوی، درم.

**ئەڵلاوەیسی:** جوورە مەقامێکی کۆنی کوردی خۆشە.

**ئەلەزیز** (العزیز): شارێکی کوردستانە لە ژێر دەستی ترکاندا.

**ئەلەقە** (باک.): ئەشکێڵ، قوڵفەی خێوەتانە، ـــ کردن: ئەشکێڵ کردن.

**ئەڵەگ** (کە.): هێڵەگ.

**ئەڵبان:** خاکێکە لەبالقانێدا بەوان دەڵێن: ئەرنەووت.

**ئەڵبانی:** ئەونەتەوەی ئەرنەووتیە، کە لەخاکی (ئەلبان)ێدا دەژین.

**ئەڵبەت:** بێگومان، بێدەرد، هەڵبەت.

**ئەڵبەتە:** هەڵبەتە، بێگومان، بێدەرد.

**ئەلبەکی** (باک.): مەنجەڵ، دیزە.

**ئەلپەشک** (باک.): بەردەپێ (بۆ گەرماوێ).

**ئەلحەد:** شوێنی مردوو لە نێو گۆڕدا.

**ئەلحەوناوینحە:** بەستەییێکی تایبەتی چۆپی کردنێیە لە کوردستانێدا.

**ئەلز:** هەلز، گیایەکە بۆ خارشتی وولاخان زۆر باشە.

**ئەلف:** ناوی تیپی یەکەمە لە ئابێی (ئەلف و بێی کوردی)، ئەلف لەسەرەتا و ناوەڕاست و دووایی ووشانەوە دەبێ، ئەلفێکی کە لە سەرەتایەدا بێ سێ جوورن: ۱) بنچینەیی. ۲) بەندیواری. ۳) پتر ئەلفی بنچینەیی ئەوچەشنەیە، کە فرێدانی دروست نییە: وەکوو ئاش، ئاوور، ئامان. هی بەندیواری فرێدانی دروستە وەکوو (ئەگەر): دەتوانی بڵێی (گەر) هی پتر ئەلفێکە لە ڕەچەڵەکدا هی ووشەکە نەبێ وەکوو (ئەمن، ئەتۆ)، کە لە بنچینەدا (من و تۆ) ن، ئەلفێکی، کە لە ناوەڕاستێدا بێ دووجوورە: ئەلفی بەندیواری، کە دوو ووشان لێکدەبەستێتەوە، وەک: سەرانسەر، بەرانبەر، سەراپا، هی دووەم پترە وەکوو خەمخووار، ڕێگوزار، کە لە بنچینەدا (خەمخۆر و ڕێگوزەر)ن، ئەلفێکی لە دووایی ووشاندا ببینرێ دووچەشنن: بنچینەیی، دەمەکی، ئەلفی بنچینەیی وەکوو: برا، ئینجا، کوێخا، دارا، هی دەمەکی ئەوە، کە کاتی هەڵگێڕو وەرگێڕانی کرداران بۆ ڕابردوو بۆ ماوەیێکی پێویست دادەنرێت وەکوو، کرا، پژا، خنکا، بێژرا.

**ئەلفە:** ئەشکێڵ، هەڵوەزنینی گوریس و ئیتر.

**ئەلف و بێ:** ناوی هەموو تیپەکانە، جارجارەش بە تیپی (ئا، ب)ێ دەڵێن وەکوو باسی نەخوێندەواری کەسێکی دەکەن دەڵێن: ئەلفوبێشی نەخوێندووە.

**ئەڵق** (ئەردە.): گەروو، گەلوو، قورگ.

**ئەلقەدار** (باک.): تفەنگی خەزنەدار.

**ئەلقاوێز** (ئەردە.): ئاڵقەرێز، کەسێکیشە کە بەسێدارە دا کرابێ. ـــ کردن: ئاڵقەرێزکردن، کەسێکی لە سێدارەدان.

**ئەڵقاپی** (ئەردە.): دەرگای گەورە، دەروازە.

**ئەڵقە:** ئاڵقە، چەمەرەیێکی خڕی وێکهاتووە لە ئاسن یا زەرد یا لە چتێکیتر، چەمەر.

**ئەڵقەخانە:** گرێ پووچکە.

**ئەلقەبەگوێ:** زێڕکڕید، بەندە، ئالقە بەگووێ.

**ئەڵقە پێکان:** پەیکەخوواردنی مار، تێک ئالان.

**ئەلقەدان:** پێچ خوواردنی مار، جینگل خوواردنی مار.

**ئەلقەدوگمە:** قوڵف دوروگمە.

**ئەلقەریز:** زنجیرێکی کورتە دەرگای پێ دادەخرێ و کە بتەوێ لە دەرگای حەوشەی بدەی لە ئالقەریزەکەی دەدەی.

**ئەلقەریزودووڵایی:** دووپارچە ئاسنی ناسراوە دەرگایان پێ قایم دەکرێ.

**ئەلقە گورس:** گورزە هێن، (پرچ).

**ئەلقەمچی:** ئالقەییەکی زێڕینە سەرەکەی لەباتی نقێم (غازی) یا (ئەشرەفی) یەکی پێوەیە ژنان لە قامکی دۆشاومژەیان دەکەن.

**ئەڵقەی چادر:** ئاڵقەی چادر.

**ئەڵماس:** ڕووژە، بەردێکی نرخدارو زۆر ڕەقە، شووشەی پێ دەبڕێتەوە و دەشکرێتە قاشی ئەنگوستیلەو هەمووجوورە خشڵێکی. ـــ تراش: پیاڵەو بەرداخێکە، کە تاشرابێ و گۆشە گۆشە بێ.

**ئەڵمان:** دەوڵەتی ئەڵمان، ئەتەوەی ئەڵمان، خاکی ئەڵمان.

**ئەڵمانی:** ڕەگەزی ئەڵمانی، زمانی ئەڵمانی.

**ئەلمەدین** (باک.): پارچەی ئاوریشمی. داردەست.

**ئەلند** (باد.): بەرەبەیان، سپێدەی بەیانی.

**ئەلۆ:** ئامرازی بانگکردنێیە دە تەلەفۆنێدا لە ئورووپاییان وەرگیراوە، لە باکوردا (ئەرۆ) بۆ مێران بەکاردەبرێ .

**ئەللوو** (لو.): هەڵوچە، هەڵووژە.

**ئەلوات:** بەدفەڕ، سەرسەری، بێ شەرم.

**ئەلۆئەلۆ** (باد.، باک.): قەلەموونە، عەلی شیش.

**ئەلۆوجەلۆ:** بڕوانە: عەلۆ و جەلۆ، خووێڕی، هەرزە، تڕۆ.

**ئەلووچە:** هەڵووژە، هەڵوچە.

**ئەلۆر** (باک.): بەفاڵ.

**ئەلۆری** (باک.): نێری بزنانە، بەبایی، بەفاڵی.

**ئەلووژە:** هەڵووچە، هەڵووژە.

**ئەلها** (ئەردە.): هانا، کەڵکەڵە، ئارەزوو، ئارەزووی دیدار.

**ئەڵێ** (بابا.): دەڵێ، سەرچاوەکەی (ووتن، کوتن، گوتن، گۆتن)ە.

**ئەلیبوورەۆ** (باک.): شۆرباوی دانی، شۆرباوی بە دان.

**ئەلیک:** کولمە، ڕوومەت.

**ئەلێی** (بابا.): دەڵێی بۆ پرسیاریشە، وەکوو: ئاخۆ، داخوو.

**ئەم:** ئێمە، مە. بۆ کەسی یەکەمی کۆ. سەر بەکۆمەڵە ڕاناوی (ئەز، تو، ئەو، ئەم، هون، ئەو ـان ـ)ە. ئامرازێکە تەنها تاقە چتێکی پێ نیشان دەدرێ (باک.) ڤێ، ڤی.

**ئەم** (دەم): مرازی کەسی یەکەم و تاکە بۆ ڕابردووی بەردەوام بەکاردەبرێ وەکوو: دەمخوێند، دەمنووسی، ئەمخوێند، ئەمنووسی.

**ئەمار:** خەرپەرێشان، خەوئالۆز، (هەورا.) ئەنبار، ژووری دانەوێڵە.

**ئەمان:** ئەمرازێکە چەند چتێکی نزیکی پێ نیشاندەدرێ یا چەند کەسێک، ئەوانە. ئامان، هاوار، داد، پەنا، هانا. بەڵام، بەلآن، وەلێ.

**ئەمانە:** کۆی (ئەم) ە، ئەمان، ئەوانە.

**ئەمە** (کە.): ئەوە، ئەم، بۆ نیزیکە، ئێمە، مە.

**ئەمەتا:** ئەوەتا.

**ئەمەتانێ:** ئەوەتانێ.

**ئەمەسە:** ئەمەتانێ.

**ئەمەگ:** چاکە، پەیمان، دەستگیری، نرخی چاکەی کەسێکییە بەسەر کەسێکی ترەوە. بە ـــ: ئەمەگدار، بێ ـــ: بەدفەڕ، سپڵە.

**ئەمەگدار:** بەئەمەگ، پەیمان ڕاگر، پەیمان بەجێهێنەر، کەسێکە چاکەو پیاوەتی لەگەڵ کرابێ لە یادی بێتێ و نەیخاتە پشت گوێیانەوەو ددان بە چاکەی چاکاندا بنێ.

**ئەمەگداری:** دەستگیری، بە چاکەی چاکان زانین و پیاوەتی ئەم و ئەو لە بیر نەکردن.

**ئەمەندە:** ووشەییێکە بەش و ئەندازەییێکی نزیکی پێنیشان بدرێ.

**ئەمەهە** (ئەردە.): ئەمە. (ئەردە.) ـــ ی: ئەمەهە.

**ئەمبا:** هاوشان.

**ئەمبار:** ـــ ی دەغڵی: هێزرە، ئەنبار. ـــ ی گەفی: مەرەک، مەسنا.

**ئەمبایی:** هاوشانی.

**ئەمبوور** (باک.): ئامووری جووتی.

**ئەمجا:** ئەوجا: ئنجا، ئەوجار.

**ئەمجار:** ئەمجا، ئەوجا، ئنجا، ئەوجار.

**ئەمجارە:** ئەم کەرەتە:

**ئەمدیوە و دیوکردن:** کەسێکی درێژ بوو بێ بەم دیوو ئەو دیودا وەربگەڕێ کردەوەکەیە. وورڕدبوونەوە و سەرنجدان لەکارێکیدا، هەڵگێڕانەوەی چتەکە.

**ئەمراز:** ئامراز، (موک.) مراز.

**ئەمرۆ:** ئەورۆ (باد.) هیرۆ، (باک.) ئیرۆ، (هەورا.) ئارۆ، (زەن.، دەر.) ئیمرۆ.

**ئەمرۆکە:** ئەورۆکە، ئێمرۆکە.

**ئەمریکا:** کەرتەی ئەمریکا.

**ئەمریکایی:** ڕەگەزی ئەمریکایی.

**ئەمسا:** ئیسە: ئیسا، لەمەوسا.

**ئەمساڵ:** ئیمساڵ.

**ئەمشەسپەنتا** (ئاو.): پاکەکانی جاویدان.

**ئەمشەو:** ئەوشۆ، ئیمشەو (باک.) ئیشەڤ.

**ئەملا:** ئەولا.

**ئەملاولا:** ئەولاولا.

**ئەملەک** (باک.): بەرخی ساوا.

**ئەملگن** (باک.): بەرخێکە تەمەنی لە دوو مانگان کەمتر بێ.

**ئەمن:** من، مۆ، ئەز، وەز، م: م گۆتە تە: من بەتۆم گوت.

**ئەمنە:** ئەمەندە، ئەونە، ئەم ئەندازەیە.

**ئەموو:** پڕ، فرەپڕ، زۆرپڕ، تێکچڕژاو.

**ئەمووس** (جا.): ئەنگوست، قامک.

**ئەموست:** بڕوانە: ئەمووس.

**ئەموستە چاو:** مەبەست لە شەوی زۆر تاریکە.

**ئەموستەویلە:** ئەنگوستیلە.

**ئەموست بەستە:** دەست خەرۆ.

**ئەموستیلە** (بابا.): ئەنگوستیلەیە، کە بۆ جووانی لەدەست دەکرێ، ئەنگوستیلەی درووماننێ، کە بەرگدرووان لە قامکی دەکەن بۆ ئەوەی دەرزی پێ پاڵ بدەن.

**ئەمهەی:** ئەمەمە.

**ئەمێ:** ووشەیێکە شوێنی نزیکی پێ نیشان بدرێ.

**ئەمێستا:** ئێستا.

**ئەمێستاکە:** ئەمێستا.

**ئەمێستە:** ئێستە. ــ کە: ئێستەکە.

**ئەن** (ئەردە.): چەن، چەند، ئەند، هەند، هەندێ.

**ئەنب** (باک.): نیشانەیێکە لەسەردانی وولاخی بەرزەی پسیر دیار دەکات.

**ئەنار:** هەنار.

**ئەنازە:** پێوانە، ئەیارە، ئەندازە، سەنگینی، قەد، بەقەد، هەندەی، ژمارە، بی ــ : بێ ژمارە.

**ئەنازە:** ئەندازە، ژمارە، سنوور، ڕادە.

**ئەنشتا**(فە.): بەرچا، خواردنی بەیانی، بەرتێشت.

**ئەنام:** ئەندام، تەن، تەلە.

**ئەنام گیان:** ئەندامی ژیان و زیندەگانی، وەکوو: مێشک، دڵ، جەرگ، هەردووک گون.

**ئەنە:** قوڵەکراوەوەی (ئەنەدۆڵە) بۆ سەرچاوەکانی ئەم فەرهەنگە.

**ئەنەگیای** (هەورا.): داگیرسان.

**ئەنە باوای** (هەورا.): تێگەیشتن.

**ئەنبار:** ئەمبار، کیلێل، کیلێر، کوونگەه، پانگەه. ــ ی تفەنگێ: بەرەم، (باک.) شەهک. ــ ی: وەردینەی نان پانکردنەوە.

**ئەنبازبوون:** ئەمبازبوون.

**ئەمبایی**(باک.): هاوشانی.

**ئەنبوو:** پڕ.

**ئەنبووژەن:** ماددی.

**ئەنتاری** (باک.): کەرا.

**ئەنتوپەهت:** گومان لێکراو، چاڤ زۆورک، چکزین.

**ئەنتیکە:** کەڤنارە، کۆنە، کۆنینە، کەل و پەلی زۆر کەون.

**ئەنتیکەخانە:** شوێنی کەل و پەلی کۆنینە.

**ئەنتین** (باک.): ئەنرین، بەخەم و پەرۆشبوون، خەفەتخواردن.

**ئەنجام:** پەرتاڵ، پرتووک، دووایی، سەرەنجام، شەوت، دووای فەرمانێک.

**ئەنجامە:** ئاسنێکی دوولاییە تای دەرگاو پەنجەرە و چتی تری پێ دادەکوترێ، لاولاوەی دەرک و پەنجەران.

**ئەنجامدان:** پێکهێنانی کارێک.

**ئەنجە:** چتی ئەنجنراو.

**ئەنجەئەنجە:** ئەنجن ئەنجن. ــ کردن: پلپل و کوتکوتکردن.

**ئەنجن ئەنجن:** چتی زۆر هەنجنراوی وورد.

**ئەنجنراو:** هەنجراو.

**ئەنجنین:** هەنجنین، جنین، هنجاندن، جناندن، ووردکردنی چت.

**ئەنجوومەن:** لێژنەیەکی تایبەتییە، کە بۆ دووان و لێکۆڵینەوە لە چتێک پێکهاتبێ.

**ئەنجوومەنی بەڕێوەبەری:** لێژنەی هەڵسووڕاندن.

**ئەنجوومەنی شارەوانی:** لێژنەی شارەوانی.

**ئەنجیر** (لو.): هەنجیر.

**ئەنجینە** (ئەردە.): چیلکەو چەواڵ، چیلکە.

**ئەند:** کەمێک، چەند، هەند.

**ئەنداخت:** تفەنگ و تۆپ بەرەو نیشانە ئاوێژتن.

**ئەندازە:** چاپان، هەند، چەندێتی، ڕادە، سێو، باڕست، تیەن، بە ــ یی: بەقەد، بارستایی، هێندەیی، لە ــ بەدەر: سەراسا، بێڕادە. ــ گر: کەسێکە بارستایی چتێکی بگرێ، ئەندازیار، ئەندازەناس، بەردەبار. ــ گرتن: بارستایی و ڕادەی چتێکی گرتن. ــ گری: بارستایی و ڕادەگیری، ئەندازەناسی، بەردەباری.

**ئەندازیار:** ئەندازەزان، ئەندازەگر. ــ ی: ئەندازەزانی، ئەندازەگری.

**ئەندام:** پەل، یەکێکە لە لیژنەیێکی چەند کەسی. بالاٚ، بەژن، ئادگار.

**ئەندەروون:** ناوەوە، ژوورەوە، ناوزگ، هەناو.

**ئەندەکۆ** (باک.): وێنجە.

**ئەندرێشە:** هەندرێشە، جوورە گیایەکە.

**ئەندۆک** (موک.): نێوداری مەشکەیە، (دەر.) ناوەڵۆک، ناومێری، (هەورا.): نێرەژەن.

**ئەندێش:** مەترسی، سام، ئەندێشی لێ مەکە.لێی مەترسە، سامی لێ مەکە.

**ئەندێشە:** پۆنج. ــ کردن: پۆنجین، ڕامان.

**ئەنراندن** (باک.): تووڕە و قەڵسکردن.

**ئەنرین** (باک.): تووڕەو زویربوون، ئازارکێشان.

**ئەنزەرووت:** حەنزەڕووت، جوورە دەرمانێکە.

**ئەنزەلۆک** (باک.): کولبە، کۆلیت، خانووێکی خراپووچکەیە.

**ئەنزێل** (باک.): لیس، جێگایەکە باڵندەی بە شەو لەسەر هەڵدەنیشێ.

**ئەنقەس:** دانستە، بەدەس، دەسنەقەس.

**ئەنگفتە:** بڕوانە: ئەنگاوتە.

**ئەنگفتن:** ئەنگاوتن.

**ئەنگاو** (کە.): هەنگاو.

**ئەنگاوتە:** دەردی کوتووپڕی، لە کاتی تووککردنێدا دەڵێن: یاخووا ــ ت لێدا، ئەنگاوتە لە گۆی دڵی دا. ئەنگاوتن: لەنیشاندان، خرچاندن، خچاندن، خیچاندن، هەنگاوتن، ئەنگافتن، هنگافتن، لێدان، (هەورا.) پێکان، پێکاندن، چتێک لە چتێکیتر بدرێ و ئازاری بدات یا زامداری

بکات. پێروو ئەنگووت: کۆهەڵات، گەلاوێژ ئەنگووت: گەلاوێژ هەڵات، نێری خۆی ئەنگووتووە: نێری خۆی ناسیوە.

**ئەنگەبین:** هەنگوین.

**ئەنگر**(شک.): سڵ، زیز، تووڕە.

**ئەنگڕان:** هەڵگڕان، زۆر دەوڵەمەندبوون.

**ئەنگۆ:** ئێوە (باک.) هن، هنگ، هنگۆ،هۆن، هوون، (هەورا.) شمە.

**ئەنگووان:** ئەنگێوران، هەنگووان، ئەنگووتن.

**ئەنگوتران:** ئەنگێوران، هەنگووان، ئەنگووتن.

**ئەنگوتراو:** ئەنگێوراو، هەنگوواو.

**ئەنگوتک** (کە.): کشک، گونگ، (بابا.) کووتک، گوندک، گشتک، گلۆر، گرووشت، (هەورا.) گونکێ.

**ئەنگوتن:** ئەنگاوتن، پێروو ئەنگووت: کۆهەڵات، گەلاوێژ ئەنگووت: گەلاوێژ هەڵات، بای بەیانی ئەنگووت: بای بەیانی هەڵی کردێ، نێری خۆی ئەنگووتووە: نێری خۆی ناسیوە، سەرما ئەنگووت: سەرما سەری هەڵداوە.

**ئەنگوچک:** سۆرانی، فەقێیانە، (باک.) تووچک، (سوور.) لەوەندی، (ڕۆژ.) ناسۆنە، نادەستێ،(رەوا.، کۆ.) ووچک، کەلانگوچک، کلک ئەنگوچک، کلکە.

**ئەنگۆر** (لوڕ.): ترێ.

**ئەنگۆر** (گەور.): تام.

**ئەنگۆرە:** لەمەوپێش.

**ئەنگوور:** بڕوانە: ترێ.

**ئەنگوس:** قامک، تبل، تل. ـــ تووتەڵە: قامکە تووتەڵە.

**ئەنگوسە برا تووتەڵە:** قامکی پەنا قامکە چکۆڵە.

**ئەنگوسە ناوگین:** قامکی ناوەڕاست.

**ئەنگوسە نما:** کلکە نما.

**ئەنگوسەگەورە:** (سپێ کوژە).

**ئەنگوسە وێڵە**(هەورا.): ئەنگوستیلە.

**ئەنگوسێچ:** جوورە هەڵوایەکە.

**ئەنگوست** (هەو.): قامک، تپل، تل.

**ئەنگوستەوێڵە:** ئەنگوستیلە.

ئەنگوستەوێڵە

**ئەنگوستنما:** کەسێکە لەبەر ناوو ناوبانگی بەقامک نیشان بدرێ، چتێکە بەقامک نیشان بدرێ.

**ئەنگوستیلە** (موک.): هەنگولسیک، هنگوستێل، گوستک، گوروستیلک، گوستیلە، ئەنگوشتەری، نگین، کلکەوانە، ئەموستیلە، پەنجەوانە، ئەنگوشتەری،(موک.) مینەکە.

**ئەنگوستیلەی دروومانێ:** ئەنگوسانە، (پیر.) قووچکە، (هەورا.) کلکەوانەی دروومانێ، دەق، سەرتلیک، هنگوستۆک.

ئەنگوستیلەی دروومانێ

**ئەنگوسێ:** کەمێک.

**ئەنگوسیلە:** ئەنگوستیلە.

**ئەنگوسیلەی بێکەسە:** ئالقە، ئەنگوستیلەی بێنقێم و قاش.

**ئەنگوشت:** قامک.

**ئەنگوشتەری** (باک.): ئەنگوستیلە.

**ئەنگوشتەوێڵە:** ئەنگوستیلە.

**ئەنگوشتنما:** چتێکە بە قامک نیشاندرێ.

**ئەنگوشتیلە:** ئەنگوستیلە.

**ئەنگوشت نیشان:** بڕوانە: ئەنگوستنما.

**ئەنگیر** (فە.): ترێ.

**ئەنگینار**(باک.): کەنگر.

**ئەنگێو:** نیشانچی، (موک.) تفەنگچی، (خۆ.، پیر.) نیشاندار، پلحەتکە، کەسێکە گەلێک جاران لە نیشانە بدات.

**ئەنگێوە:** بڕوانە: ئەنگێو.

**ئەنگێوران:** ئەنگووان، لێدران، پێکران، خچان، خرچان، خێچان، بەرکەوتن، وەبەرکەوتن.

**ئەنگێوراو:** ئەنگوتراو، ئەنگاوتراو.

**ئەنوو:** پلمە، پەژارە، پەرۆش.

**ئەنوا:** ماڵ، سامان، دارایی.

**ئەنوختە:** پاشەکەوت، ئابۆری.

**ئەنوختەکار:** بەئابۆر.

**ئەنوختەکردن:** پاشەکەوتکردن.

**ئەنۆش** (باک.): نۆشی گیانت بێ.

**ئەنی** (باد.، کە.، باک.): نێوچاوان، هەنیە.

**ئەنیا** (باک.): هێز، تین.

**ئەنیزک** (باک.): ئانیشک.

**ئەنیسک** (هەورا.): هەنیسک.

**ئەنیسۆن:** ئانیسۆن، بەری گیایەکییە وەک کونجی وایە، بەڵام تۆزێک گەورەترە بۆ دەرمان بەکاردەبرێ.

**ئەنیش:** ترس، باک، هەراس.

**ئەنێش:** ئەندێش.

**ئەنیشە:** بیر، هۆش، نیهاد.

**ئەنیشک:** ئانیشک.

**ئەنین** (باک.): هاوار، دادو ڕۆڕۆ.

**ئەو:** بە: دەس ئەو دەس، دەست بە دەست. (باک.) وی، وێ، ئەڤ. (سور.) ئەوێ بۆ مێ، (هەورا.) ئەی. (باک.) ئەوێها بۆ نێر. (هەورا. کۆن) ئەزێچ. ـــ ان: بۆکۆ، جێناوی نیشانە: *ئەو* ژنە. جێناوی کەسی سێیەمی تاک: بەرهەمی *ئەو*.

**ئەوا:** وا. ـــ هات: واهات، ئامرازی ئێستاییە وەکوو: ئەوا دەڕۆم: واتە ئێستا دەڕۆم.

**ئەوارە** (باک.): ئاوارە، بێکار، بێ ئیش.

**ئەوارەیی** (باک.): ئاوارەیی، بێکاری.

**ئەوازین:** وازن، زریان.

**ئەواگل:** واگل، هەو، گەڕیانەوە، گەڕانەوە. (ئەردە.) گەڕانەوە.

**ئەوان:** (هەورا.) ئانیشا، (باک.) وان، ڤان، ئەڤان. (زەن.) ئانیلە، (کە.) ئەمان، (هەورا.) ئاذی بۆگەلی نێرومێیانی دوور یا نادیارە.

**ئەوانە:** ئەمانە، ئەڤانە، ئەوان، ئینێلە، (هەورا.، زەن.) ئانیشا، بۆ دووروگەلە.

**ئەوانەی:** ئەوانە + ی (ئامرازی خستنە سەر).

**ئەوانتر:** ئەوانیتر، ئەوانیدی.

**ئەوانیتر:** ئەوانتر، ئەوانیدی، کەسانی تر.

**ئەواها** (باک.): ئەو بۆمێ.

**ئەواهێ** (سوور.): ئەو بۆ مێ.

**ئەوە:** (زەن.) ئینە، (دەر.) ئەیە، یە، (هەورا.) ئید، (باک.) ئەڤ، ئەڤە، (کەل.) ئی، ئاڤە چتێکی دووری پێ نیشاندەدرێ، بۆ ئەوەی: ژ بۆ.

**ئەوە** (فە.): شەوەم.

**ئەوەئامای** (هەورا.): هاتنەوە.

**ئەوەنێس** (هەورا.): دۆزەرەوە.

**ئەوەنێستەی** (هەورا.): (هەورا.) نێستەی وە، دۆزینەوە.

**ئەوەتا:** (خۆ.) ئێهێ، (باک.) ئەڤەڤە، ڤا، ڤایە، ها، هانێ، ئەمەسا، ئەمەستا، ئەمەتا، ئەتا، ئەتانێ، تیی، ئەوەتانێ، (هەورا.) ئینە.

**ئەوەتانێ:** ئەمەتانێ، ئەوەتا، ئەوەتێهێ، ڤەیە، یەسە، (خۆ.) ئێهێ.

**ئەوەتاویا** (هەورا.): تاواوەوە.

**ئەوەتاهی** (خۆ.): ئەوەتێهێ.

**ئەوەتە:** چتێکی دووری پێ نیشان دەدرێ، ئەوەتا، ئەوەتانێ.

**ئەوەتەی:** ووشەیەکە سەرەتای کاتی روودانی کاروبارێکی نیشاندەدا: ئەوەتەی (لەوەتی) بیرم کردۆتەوە هەر ئەمەگدار بووم.

**ئەوەتی:** لەوەتی، لەوکاتەوەی کە.

**ئەوەتێهێ** (خۆ.): ئەوەتاهێ، ئەوەتانێ.

**ئەوەجە:** ئەوجە، دەبوو، پێویستە، گەرەکە.

**ئەوەسە:** ئەوەتە، ئەوەتا، ئەوەتانێ.

**ئەوەسیای** (هەورا.): حەسانەوە.

**ئەوەکان** (کە.): هینەکان، ئەوانی دی.

**ئەوەکە:** ئەوی دی، ئەوەکەی تر.

**ئەوەگیریا** (هەورا.): گیراوەوە.

**ئەوەڵ:** یەکەم، هەوەڵ.

**ئەوەڵەمین:** یەکەمین.

**ئەوەند:** هەند.

**ئەوەندە** (باک.): ئەڤەندە، ئەڤهەندە، ئەوئەندازە، ئەوندە، هێندە، (دەر.) ئەوقەرە، ووتەیێکە ئەندازەی چتێکی دیاری پێ نیشاندەدرێ.

**ئەوەندەی:** هەندەی، هێندەی.

**ئەوەندی:** هەندی.

**ئەوەی:** ئەوە +ی ئامرازی خستنە سەر.

**ئەوەیە:** ئەمەیە، کەمێک بۆ doorە.

**ئەوباش:** (دەر.، خۆ.) لۆتی، ترۆ، سەرسەری، ئەلۆجەلۆ، هەرزەوهووززە.

**ئەوباڵ:** وەباڵ، ئۆباڵ.

**ئەوبەر:** بەرەکەی دی، لایەکەیتر، ئەولا، ئەوپەڕ.

**ئەوپەڕ:** ئەوبەر، بەرەکەی دی، لایەکەی دی، بنەبان، دووایی، هەرەدووایی، کۆتایی.

**ئەوتاندن** (باک.): وەڕاندن.

**ئەوتەئەوت** (باک.): وەڕەوەڕ.

**ئەوتەو:** بڕوانە: ئەوتۆ.

**ئەوتر:** ئەویکە، ئەویتر، ئەویدی.

**ئەوتۆ:** دەسا، ئەئاوا، هۆتۆ، وەتۆ. سەلاحەددینی ئەیوبی پیاوێکی ئەوتۆ بووە، کەم و زۆر ئاوڕی لە نەتەوەو وولاتەکەی خۆی نەداوەتەوە.

**ئەوتۆیی:** هۆتۆیی، وەتۆیی.

**ئەوەتی:** ئەوەتەی.

**ئەوتین** (باک.): وەڕین.

**ئەوجا:** ڤێجا.

**ئەوجار:** ئەمجار، دیسا، دیسان، ئەوسا، هەوجا، سەرلەنوێ، ئەمجارە، هەم، لەمەوپاش، ئەیجارە، لەمەودووا، ئینجا، لەوە بەولاوە، هەمیسان، لەنووێوە، (باک.) پاشکی، ئیجار.

**ئەوجاریش:** دیسانەوە، هەمیسانیش.

**ئەوجە** (ئەردە.): پێویست، پێداویست.

**ئەوچەند** (باک.): هێندە، هەندەی.

**ئەوداڵ:** ئاوارە، دەربەدەر، وێڵ، سەوداسەر، (باک.) ئیپڕۆڕۆ، عەوداڵ، وارەسە، خاسگەل، بگەردک. ــــ ی: ئاوارەیی: وێڵی، دەربەدەری، سەوداسەری.

**ئەودەر:** دەرەوە، هەندەر.

**ئەودەمە:** لەوکاتەدا.

**ئەودەمەی:** (فە.) یەمە.

**ئەور** (لو.، فە.، باک.): هەوور. ــــ ی بارانێ: هەوری بارانێ. ــــ ی تەنک: هەوری تەنک. ــــ رەش: هەوری ڕەش، گوڕڕەی ئەوری: گوڕڕەی هەوری.

**ئەورا** (هەورا.): برسی، وورسی.

**ئەوراڤ** (باک.): هەورێکە بارانێکی سووکی لێ بێ و زووکۆی بکات.

**ئەورام:** ڕەوایی، پێشڕەفت، دروستی، ساز، سازگاری.

**ئەوراوی** (باک.): هەوراوی.

**ئەورە:** ئەوێ.

**ئەورەمزدا** (ئاو.): ئاهوورە مەزدە، خولای گەورە و تاق و تەنیا، داهێنەری زەوی و ئاسمان.

**ئەورەنگ:** دەبدەبە، شکۆ، پایە، تەختی پادشایی، هۆش، تێگەیشتن.

**ئەوورترشکی** (باک.): هەورە تریشقە.

**ئەوڕۆ:** ئیڕۆ، ئیمڕۆ، ئەمڕۆ، (هەو.) هەوڕۆ، ئارۆ.

**ئەوڕوو** (فە.): مەلاشوو.

**ئەوڕووپا**: بڕوانە: ئوڕووپا.

**ئەوڕووپایی**:بڕوانە: ئوڕووپایی.

**ئەوڕۆکە**: ئەمڕۆکە.

**ئەوریشم** (کە.): ئاوریشم.

**ئەورین** (هەورا.): نیشتن.

**ئەوسا** (هەورا.): سا، ئەوجا، (باک.) پاشکێ، سەرداوێ، ئەوکاتی، لەوەدروا، لەمەودروا.

**ئەوسا**: ئەوحەلە، ئەودەمە، ئنجا، ئەوجا، جاران، لەمەوبەر، ئەوکاتە.

**ئەوسار**: هەوسار، ڕەشۆڕەشمە.

**ئەوشان** (کە.): هاوشان، جوورە گیایەکە.

**ئەوشۆ**: (باک.) ئیشەڤ، ئەمشەو.

**ئەوڤا**: (باک.) ئەڤ، هێندە، ئەوەندە.

**ئەوقە**: تووش، تووشیار، ئاوقە، دووچار.

**ئەوقەدبوون**: ئاوقەدبوون.

**ئەوک** (باک.): هەرامە، کابرا، وانێک، هین، گەروو، قوڕگ.

**ئەوکاتە**: ئەوسا، لەوکاتەدا.

**ئەوکەسە**: ئەو.

**ئەوکردنەوە** (فە.): کردنەوە، ئاوەڵەکردنەوە. (فە.) درانە ئەوکە: دەرکەی بکەوە.

**ئەوکێ** (زا.): یارۆ، هەرامە، کابرا، وانێک، هین.

**ئەوگار** (ئەردە.): پەرێشان، گرفتار، بریندار، دڵبریندار.

**ئەولا**: هۆولا، ئەملا، (هەورا.) ئیلا، بەرانبەر.

**ئەولاتر**: لایەکەی تر، خووارتر، ئەوبەرتر.

**ئەولاولا**: ئەملاولا، (هەورا.) ئەیلاوئەولا.

**ئەوله** (باک.): دڵنیا، ئەرخەیان. ــ بوون. ــ کردن.

**ئەوڵە** (فە.): خروێرکە، خرووکە، ئاوڵە.

**ئەلەگا** (باک.): پەنا، پەناگاه.

**ئەوڵەمین**: پێشین، یەکەمین، سەرەتا، بەرگ، بەرگین، یەکەم.

**ئەولەو** (فە.): لافاو، لێمشت، سێلاو.

**ئەولەیی**: دڵنیایی، ئەرخەیانی.

**ئەونە** (ئەردە.): ئەوەندە، یەند، ئەوئەندازە، ئەم ئەنازە.

**ئەووەختە**: ئەوسا، ئەوڕۆژە، ئەودەمە.

**ئەووک**: گەروو، قوڕگ.

**ئەوها**: ئاوا، وا.

**ئەوهە**: ئە.

**ئەوهەی**: ئەوەی.

**ئەوهندە** (باک.): هێندەی، ئەوەندە.

**ئەوهێندە**: بڕوانە: ئەوهەندە.

**ئەوێ** (باک.): دەبێ، ئەشێ، ئەبێ، وێ، وێندەرێ، دەرد، وێرێ، وور، ئەوێندەرێ، دەراهیا، بۆ جێگایەکی تۆزێک دوور بەکاردەبرێ، لەسووریەدا ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە بۆ مێ: ــ گۆتە من: ژنەکە پێی کوتم. ــ خار: ئافرەتەکە خواردی.

**ئەوی** (موک.): ــ گەورە: یامەزن، (سور.) ئەو یا ئەوە بۆ نێرینانە: ئەوی خار: ئەوخوواردی، (دەر.) ئەو.

**ئەویی**: مرازی بەندیوارییە وەکوو ووتەی ئەوەی: ئەویی کوردە ئازایە. ئەوی بفرۆشە. ئەویتر، ئەویدی، ئیتر، ئیکە، کە.

**ئەویچ** (ئەردە.): ئەویش.

**ئەوێدەمێ** (موک.): ئەودەمی، ئەوکاتی.

**ئەویدی**: ئەویتر، ئەویکە.

**ئەویدیکە**: ئەویتر، ئەویدی.

**ئەوێستا**: ئێستا، (خۆ.) هەنووکە، (هەورا.) ئیسە.

**ئەوێستی**: ئێستا.

**ئەوێستیکە**: ئێستاکە.

**ئەویسک** (باک.): باڵندەیەکە.

**ئەویکە** (بابا.): ئەویتر، ئەویدی.

**ئەویندار**: بڕوانە: ئەڤیندار.

**ئەوێندەر**: ئەوێ.

**ئەوێندەرێ**: ئەوێ.

**ئەوێها** (باک.): هۆوە.

**ئەویهێ**: هۆوێهێ.

**ئەهـ**: ئەها، ئاها، ئاه، ئاووخ، ئە، ووتەیێکە لە کاتێکدا بەکاردێنرێ،کە مەردوم چتێک لەدەستی خۆی یا کەسێکیتر بقەومێ و چتێکی ناخۆش ببیسێ یاببینێ، بۆ پەرۆش و خەفەتباری بەکاردەبرێ.

**ئەها**: لە وەڵامی کەسێکی نابووت و پووچەڵەدا بەکار دەبرێت، کە هەڕەشە بکات واتا خۆی چیە تا چتی وای لەدەست بێت، ئاها، هاها، حا، ئەه، بۆ ئاگادارکردنەوەیەو بێدارکردنەوەیەو بانگکردنێیە. ــ خووا خۆشت کات. لە کاتی بیستن و یا دیتنی چتێکی سەیردا بۆ سەر سووڕمانێ بەکاردەبرێت، دەها، بەخ، خۆش، خۆشخۆش، وەه، وەهوەه، بۆ ئافەرین و پەسندکردن و لێخۆشهاتنە.

**ئەهاک** (لو.): قسڵ.

**ئەهاو**: بۆ بانگ کردنێکی doورە.

**ئەهاها**: بۆ بانگ کردنێکی دوورترە.

**ئەهای**: بۆ ئاگاداری و بێدار کردنەوەیە، چاو، چاوچاو، بڕوانە، بنواڕە.

**ئەهەک** (کە.): قسڵ.

**ئەهۆ**: ئەها.

**ئەهوورە** (ئاو.): خودای دادوڕاستی.

**ئەهوورەمەزد** (ئاو.): خودای ئاسمان.

**ئەهێو**: هەیهۆ لە کاتی گاڵتە پێکردنێدا بەکاردەبرێ.

**ئەی:** هەی بۆ قسە لەگەڵکردن یا بۆ بانگکردنە: ــ پیاوی چاک بۆ واتکرد؟ ئەی خودا داد لەدەست ڕۆژگاری چەپگەر. بەڵێ: فەرمانەکەت بەجێ هێنا؟ ئەی، ئا، ئای، ئۆھ. لەکاتی ئێش و ئۆفیشدا بەکاردەبرێ. (هەورا.) ئەو، ئەوە، ئەدی (بۆ پرسیارە)؛ ئەمن دەڕۆم ئەی تۆش نایەی.

**ئەی ئەی** (کە.): بەڵێ بەڵێ، ئەدی ئەدی.

**ئەیا، ئەدا** (هەورا.): دایک.

**ئەیار:** مانگی (مایس)ە، کە سی و یەک ڕۆژە.

**ئەیارە:** عەیار، عەیارە، پێوانە، ئەندازە، (باک.) پێست، خەز.

**ئەیارشیر:** کونەیەکە لە پێستی بۆ پێوانی شیری بەکار دەبرێ. ــ شیرک: خیگە یا کوندەیەکە بۆ پێوانی شیری بەکاردەبرێت.

**ئەیاری شیری:** کوندەییێکە شیری پێ دەپێودرێت.

**ئەیاری پەنیری:** کوندەییێکە لە پێستی بۆ پێوانی پەنیری بەکاردەبرێ.

**ئەیاسی** (باک.): پەردەی گەمێیانە.

**ئەیە:** (باد.، کە.) داخوا، داخۆ، ئایا وە نیە؟، (فە.، هەورا.) ئەمە بۆ نزیکە.

**ئەیەرۆ:** بڕوانە: ئەیرۆ.

**ئەیجار:** ئەمجار، ئەوجار.

**ئەیدەر:** ئێرە، ئێستا، ئەوە.

**ئەیرە** (کە.): ئێرە.

**ئەیردانە** (کە.): ئێرە.

**ئەیرۆ:** ئایرۆ، ئەیەرۆ، وەیرۆ، (هەو.) ئەیشێرە، وەیشێرە، شێرە، (ڕەوا.) کەسسێ، قەد کەسسێ، ئەیقەدکەسسێ. هەیرۆ. زاراوەی تایبەتی ژنانە لە کاتی لێقەومانێدا بەکاری دەبەن یا لەکاتی بیستنی چتێکی ناخۆشدا.

**ئەیرییەنە** (ئاو.): ئێران.

**ئەیزەد** (باک.): خودا، ئێزەد.

**ئەیزەدی** (باک.): یەزیدی، خوداپەرست، یەزدانپەرست.

**ئەیزێ:** دەڵێی، چما، چمان، وەدەزانی.

**ئەیسووتام وەی برژام:** گەمەییێکی منداڵانە.

**ئەی شێرە** (هەورا.): بڕوانە:ئەیرۆ.

**ئەیقەز** (باک.): ئامادە، ساز، ئەزــم بێمە نک تە: مــن ئامــادەم بێمە لای تۆ.

**ئەیقەزاندن** (باک.): ئامادەوسازکردن.

**ئەیقەزین** (باک.): ئامادەوسازبوون.

**ئەیقەدکەسسێ** (ڕەوا.): بڕوانە: ئەیرۆ.

**ئەیلا** (دەر.): ئەولا.

**ئەیلاوئەولا** (دەر.): ئەملاوئەولا.

**ئەیلۆ** (باک.): هەڵۆ.

**ئەیلوول:** مانگی نۆیەمینی ساڵی ڕۆژییە، کە لە نیوەڕاستی ئاب و تشرینی یەکەمدایەو سی ڕۆژە.

**ئەین:** ڕۆژی هەینی.

**ئەینا:** دەنا نا، ئەدی نا، چۆن نا، کە پرسیارێک بکرێ ئایا تۆ گەل و نیشتمانت خۆشدەوێ، کە لە بارێکا خۆشی بووێن لە وەڵامدا دەڵێ: ئەینا واتا ئەدێنا؟.

**ئەینە** (هەورا.): ئەوێ، ئەوێندەرێ.

**ئەینوو:** ڕۆژی هەینی.

**ئەینی:** هەفتە، ڕۆژی هەینی.

**ئەیوا** (کە.): ئەدی وایە، وایە.

**ئەیوان** (هەورا.، باک.، کە.): هەیوان، بێلاّیی.

**ئەیوای:** وەیوای.

**ئەیهاوار:** ئای وای، هەیهاوار، ئەیداد، وەیداد، وەیهاوار، هەیداد.

**ئەیهۆ:** ئەیهوو، هەیهۆ لەکاتی وەڕەز بوون لێ خۆشنەهاتنی گوفتار یا کردارێکدا بەکاردەبرێ.

**ئەیهۆهەیهۆ:** بۆ جەختکردنە.

**ئەیهوو:** ئەیهۆ، هەیهۆ، بۆ ڕابردوویەکی زۆر کۆن بەکاردەبرێت، واتە لە کاتی گێڕانەوەی سەربردەییێکی زۆرکۆندا، کە مرۆ وەبیری بێتەوە یا بیری لێ بکاتەوە دەڵێ ــ واتە زۆر کۆن و دوورە.

**ئەیی:** بەڵێ، وایە، بەڕاستی وایە.

**ئەییی:** ئەدی، بەڵێ بەڵێ. لەکاتی باوەڕنەکردن و یا قەشمەری پێکردنێدا بەکار دەبرێت.

**ئەییینی:** ئەڤینی، خۆشەویستی، میهر، حەزلێکردن.

**ئخ:** ووشەی دەنگییە.

**ئخ:** دەنگی ئاوێژتنی بەڵغەم و تفە کاتێکی مرۆ کەبیەوێ لە گەرووی خۆی فڕێبدات.

**ئد** (باک.): لە، دە، (باک.) ئل.

**ئدلب:** شارۆچکەیەکی کوردانــە کەوتۆتــە ڕۆژهــەڵاتی ژۆری شــاری (حەڵەب).

**ئزمرێ** (بابا.): جوورە ترێیەکە.

**ئسهار** (لو.): هەڵگێڕانەوەی زەوی ناو باخ و باخچانە.

**ئسترانە:** لاوکێکە، کە سەرگوزشتەی دڵداریێتی نیشان بدات.

**ئستێرک:** شووقەللەت.

**ئستینگ** (باد.): زەردەواڵە، زەرگەتە.

نشتر

**ئشتر** (فە.): ووشتر.

**ئشک** (باک.): قولاپە، دەمارە هەرە ئەستوورەکەی سەرەوەی پانییە.

**ئشکێل:** ئەشکێل، فەرمان، دەستوور، توانایی، دەستەڵات.

**ئل** (باک.): بڕوانە: (ئد).

**ئلە** (باک.): مرازێکە بۆ وەڕاست گێران و جەخت بەکاردەبرێ: ــ تێ یێ ئەم هەرن نان بخۆن: دەبا ئێمە بچین نانی بخۆین.

تلە

**ئلۆل:** هلۆل، هەلۆل، ئاوخاڵی.

**ئلە** (باک.): هەڵۆ.

**ئلەو** (باک.): هەڵۆ.

**ئلێمی** (باک.): ملپێچ، شاڵگەردن.

**ئم:** چمۆڵە، کەسێ کە چمۆڵە لە کەسێکی تر بنێ دەڵێ: (ئم). ـــ لێکردن: چمۆڵەلێکردن و بەپانەوە دەست بۆ لای وی درێژکردن. لە وەلامیشدا دەڵێن: ئم لە خۆت.

**ئمبار:** عەمبار، ئەنبار، ژووری تایبەتی دەخڵ ودانان.

**ئمجا:** ئنجا.

**ئنجا:** ووتەیە کە لەپاش دەست هەڵگرتن لە چتێک و دەست بە چتێکی ترکردن بەکاردێنرێ: تاتێستامن ئەم پەرتووکەم دەخوێندەوە، ئنجا نۆرەی تۆیە. ـــ کوو: ئینجاکوونێ.

**ئنجک** (فە.): جل، بەرگ.

**ئنجنار** (کۆ.): گیایەکی دەستچینە وە گوڵەبەڕۆژەی دەچێ تامی ناوکی وەک باینجانییە گوڵەکەی مۆرە و گەڵاکانیشی دەکەنە دۆڵمە.

**ئنجیل:** نامەی ئاسمانی عیسا پیغەمبەرییە(د) چووار بەرگن، ئینجیلی لۆقا، ئینجیلی مەتی، ئینجیلی یوحەننا، ئینجیلی مەرقۆس.

**ئە یا ئەهە** (باک.): ئاها ئەها، ئامرازێکە بۆ زویری و تیژە جارێ بەکاردەبرێت: ئەم (ئە)دێ عەلۆ ژمەرە تالانا ڤەگەرێنێ: ئاها ئەو عەلۆیە تالانێ بۆ مە بگەرێنێتەوە.

**ئەهیا ئەهە** (باک.): بۆ وەبیرهاتنەوە و ترس بەکار دەبرێت: ئەهە مەجەنتێ خوە دگەمێیێدە هێشتیە، واتا ئەهە ئێمە جانتایەکەی خۆمان لەناو گەمێییەدا بەجێ هێشتووە.

**ئۆ:** بۆ بانکردن بەکاردەبرێ: ئۆ بابە، هۆدایە، هۆ لە کاتی ئێش و ئۆف پێگەیشتنێ و سەردەمی واق و وڕمانیشدا بەکار دەبرێ: ئاخ، ئۆف، وای، ئای، ئۆی، ئۆهـ، ئەی، وەی، کورتکراوەی ناوی(ئۆمەربل)ە بۆ سەرچاوەکانی ئەم فەرهەنگە، بۆ سەرسووڕمانیش بەکاردەبرێت.

**ئۆب:** بڕوانە: ئۆبە.

**ئۆبال:** گوناح، سووچ، تاوان، وەبال. ـــ ت بەئەستۆم.

**ئۆبە:** دەستەخێوەتێکی خێلاتانە، هۆبە، دەستە، چەند، کۆشکێکی دارینە، کە بەراپێخ و فەرش داپۆشرابێ.

**ئۆبەر** (باک.): لێفەی هەرسەرەوەیە.

**ئۆبەری** (باک.): لێفەی چکۆڵە.

**ئۆتۆ:** ئامرازی بێدەستەڵاتی و سەرسووڕمانییە. ـــ ئەز بەتەرا کەتم بەلایێ: ئاها ئەوا ئەمنیش بەتۆوە کەوتمە ناو بەلایێ، ئۆتۆدکەم ناکەم، بەلایێ خوە ژ من ڤەناکەی.

**ئۆتۆمۆبیل:** بەزۆک، خۆشبەز، کارامە. ـــ چی: بەزۆکەوان، خۆشبەزەوان. ـــ ی زرێدار: بەزۆکی زرێدار.

**ئۆجاخ:** ئاگردان، بنەماڵە. ـــ کوێر: بێ منداڵ.

**ئۆجک** (باک.): زگ.

**ئۆح:** بڕوانە: ئۆحە.

**ئۆحە:** دەنگێکە بۆ ئاگادارکردنەوە و گێڕاندنەوەو ڕاوەستاندنی ڕەشەوولاخان بەکاردەبرێ. ئوهـ، ئۆحەحە: ئۆحەحەی.

**ئۆحەحە:** بڕوانە: ئۆحە.

**ئۆحەحەی:** بڕوانە: ئۆحە.

**ئۆخ:** ئاخ، ئۆف، (باک.) ئاخش، ئۆهـ، لێ، ئۆخەی، ئۆخەیش، خەی. دەنگێکە لەکاتی خۆشی یا ناخۆشیدا هەستی پێدەردەبڕێ، بەس.

**ئۆخەی:** بڕوانە: ئۆخ.

**ئۆخەیچ** (ئەردە.): بڕوانە: ئۆخ.

**ئۆخەیش:** بڕوانە: ئۆخ.

**ئۆخر:** بڕوانە: ئۆغر.

**ئۆخزن:** ئۆقرە، ئارام.

**ئۆخزن هاتن:** دڵداکەوتن، کفت و کۆی دڵ، دامرکان.

**ئۆ خووەش:** ئۆخەی، ئۆخەیش، ئامرازێکە بۆ خۆشی بەکاردەبرێ.

**ئۆخین:** پەرۆش خواردن، خەمخۆری.

**ئۆدە:** دیو، ژووری خانوو.

ئۆردەک

**ئۆردەک:** قاز.

**ئۆردوو:** لەشکر، ئۆردی، هۆردوو، پێگەهـ. ـــ بەز: لەشکرگە، هۆردووبەز. ـــ گا: لەشکرگا.

**ئۆردی** (هەورا.): ئۆردوو، هۆردوو.

**ئۆرناگ** (باک.): غوونە.

**ئۆرۆمۆن** (هەورا. کۆن): هەورامان.

**ئۆزۆر** (هەورا. کۆن): ئازار.

**ئۆزیرە** (باجە.): دوورێنێ.

**ئۆش:** هۆش، هۆنش، بۆ ڕاوەستاندنی گوێدرێژان بەکاردەبرێ.

**ئۆشت:** ئۆش.

**ئۆغەمن:** (هەو.) ناوی هەفتەی چووارەمینە لە هەشت هەفتەیەکانی زستانێدا و لە نێوە ڕاستی مێرەم و پیتدایە.

**ئۆغر:** ڕێین، ڕۆیشتن، چوون، مالاوایی، سەفەری خێر، کۆچی پیرۆز. ـــ ت خێر بێ: ئۆغراتە یا خێر بێ، کۆچت خێربێ، ئۆغربێ؟ بۆ کووێ بەخێر دەچی؟.

**ئۆف:** ئاهـ، ئۆ، ئۆهـ، ئاخ، ئای، ئۆف. ووشەیە کە لەکاتی ئێش و داخ و خەفەت پێ گەیشتنێدا بەکاردەبرێت.

**ئۆفە:** نەخۆشییێکی یەکسمە وەک هەلامەت ئاو بەلووتیدا دێتە خووارێ.

**ئۆفت:** بڕوانە: ئۆف.

**ئۆفلاز** (باک.): خۆشەویست، ژیرکەڵە.

**ئۆقرە:** هەدا، ئارام، تۆتکە. ـــ گرتن: ئارامگرتن، تۆتکەگرتن، تۆتکە خواردن، دابین بوون.

**ئۆقیانووس:** دەریالووش.

**ئۆکە** (هەورا.): ئەوێ، (فە.) ئەورە.

**ئۆگر:** ڕام، دەستەمۆ، هۆگر. ـــ بوون: ڕاهاتن، ڕامبوون، کەتن، سەرهەوا. ـــ ی: ڕامی، دەستەمۆیی، هۆگری.

**ئۆلاق** (زا.): ئەسپی ناڕەسەن.

**ئۆلە** (باک.): باڵندەییێکە.

**ئۆلۆلۆ:** ئای ئای، ئۆف ئۆف، لە کاتی خەم و پەرۆش و ئازار پێگەیشتنێدا بەکار دەبرێ.

**ئۆلی** (باک.): ژوور.

**ئۆمەر:** ناوی پیاوانە لە (عمر)ی عەرەبییەوە وای لێهاتووە.

**ئۆمەربل:** خێڵێکی بەناوبانگی کوردانە لە پێش پەیدابوونی ئیسلامدا پیاوێکی ناودار ناوی هۆمەر (ئومەر) بووە، ئەم خێڵە بەناوی ویەوە کراوون. لە ئێرانێ زۆرن، لە کەناری مووسڵ ٥٠٠ ماڵ پترن لەناو دزەییانیشدا هەن، دێیەکی ٢٥ ماڵی لەلای کفرییە، ئەمن خۆم لەو خێڵەم.

**ئۆمەرکا:** ئێلێکی بچووکی کوردانە دەکەوێتە لای رۆژهەڵاتی شاری قامیشلوو.

**ئۆمەریا:** ناوی هۆزو ئێلێکی کوردانە لە ژووررووی شاری نسیبینێ نزیکی سەدهەزار مرۆڤ هەیە.

**ئۆوحە:** ووشەیێکە رەشە وولاخی پێ رادەوەستێنرێ.

**ئۆه:** ئۆخ، ئۆف، ئاخ، وای، ئەی، ئای، لەکاتی ئێش و ئۆف پێگەیشتن و ناهومێدی و سەر سوورمانێدا بەکاردەبرێت.

**ئۆهە:** بۆ راوەستاندنی ئاژاڵان بەکاردەبرێ.

**ئۆهنای** (باک.): ئۆخەی، ئۆخ، ئۆخەیش، ئۆه، بۆ خۆشییە. ـــ ئەڤ چ خوەشە: ئۆخ ئەو باغە چەند خۆشە.

**ئۆهۆ** (باک.): ئامرازی بێ دەستەڵاتی و سەرگەردانییە. ـــ رەنگە تالانەکەمان بۆ بگێرێتەوە.

**ئۆی:** ئای، ئاه، ئاخ، وی، ئۆه، ئۆف، وای. لە کاتی ئازارپێگەیشتنێدا ئافرەتان پتری بەکاردەبەن.

**ئۆیە:** جۆرە چنراوێکی تەنکی کونکونە بۆ جوانی لە قەراخ چتەمەکان دەدروێت.

**ئۆیها:** ووشەیەکە بۆ تێبەردانی سەگ بەکار دەبرێ.

**ئۆیهای:** ئۆیها.

**ئوتاخ:** وەتاخ، ژووری دانیشتن. ـــ ی خەو: وەتاخی نوستن.

**ئوترەکای** (هەورا.): قەڵشان، قرنجان.

**ئوتول** (ئەردە.): تەختی رەوان.

**ئوتوو:** مرازێکە بۆ دەق پێدانی جل و بەرگ بەکار دەبرێ. ـــ چی: ئەو کەسەیە نووتوو دەکا.

**ئوتی:** نووتوو.

**ئوجاخ:** ووجاخ، کووانگ، قووڵکە. ـــ کوێر: بێ منداڵ.

**ئور** (باک.): وورگ، چیکڵدانە.

**ئورز** (رۆژ.، شەبەک): هەستە.

**ئورفە:** شارێکی کوردانە لە ١٨ ویلایەتەکانی ژێر دەستی ترکاندا لە رۆژاوای ئامێدی و دیاربەکرییە.

**ئورمێ:** (وورمێ) شارێکە (١٦٠) ساڵ لەمەو پێش هەمووی کوردبوون ئێستا کراونەتە (تورک) لە نێوانی کوردستان و ئازەربایجاندایە.

**ئورووپا:** پارچەییێکە لە پێنج پارچە ووشکانییە کانی سەر زەوی.

**ئورووپایی:** دانیشتووانی ئورووپا، زمانی ئورووپاییان.

**ئوسا:** وەستا. ـــ ی دیوار: وەستای دیوار، بەننا.

**ئوشن** (کەل.): کوتن، گۆتن، ووتن.

**ئوف** (باک.): ئۆف، مرازی ژان و ئێشدەربڕینە، (بابا.) ئۆخەی، ئافەرین.

**ئوفەر:** مەقاو، هەڵامەت، ئەخۆشییێکە تووشی چارەوێیان دەبێ.

**ئوففە:** بروانە: ئوفەر.

**ئولاغ:** وولاغ، برێتییە لە رەشە وولاغ و کەر و ئێستر و وولاخی بەرزە. ـــ دار: کەردار، وولاخدار. ـــ ی: کەرداری.

**ئولاق** (باک.): ماینی بێ تین و لاوازە.

**ئومێد:** هیوا، هەویا، هومێد، هێڤی، (باک.) پونگال. بە ـــ: هیوادار. ـــ کردن: ئومێدەواری. نا ـــ: بێهیوا، بێ قیری، بێ هێڤی. نا ـــ بوون: دەست لێ شوشتن، رەچاوگرتن، پشت پێبەستن.

**ئومێدەوار:** بەهیوا، هێڤیدار. ـــ ی: بەهیوایی، هێڤیداری.

**ئونجە** (باد.): وێنجە.

**ئونیشک** (بابا.): کەرە، رۆنی کەرە.

**ئوو:** (باک.) و، وە.

**ئووب** (باک.): ئۆبە.

**ئووتی** (باک.، فە.): وتوو.

**ئووچک** (باک.): تەنگوچک.

**ئوود** (باک.): رێز، قەدر. ـــ گرتن: رێزگرتن.

**ئوودە:** بەرێز، سەنگین و گران، شایانی رێز.

**ئوور** (باک.): زگ.

**ئووریەلیشک** (باک.): ترتزۆک، بۆری خوواردنێ.

**ئوورت** (باک.): مەزرای نزیک گوندی، نیشتمان.

**ئوورک** (باک.): وورگی وولاخان.

**ئوورین** (باک.): لووراندن، لوورەی سەگ و گورگانە.

**ئووزەر** (باک.): جێگا.

**ئووسرە** (بل.): کەندووی ئاردودانەوێڵەیە.

**ئووشی** (باک.): هێشوو، گوڵەگەنم و جۆ و نیتر.

**ئووف** (بابا.): بروانە: ئوف.

**ئووفە** (بابا.): کولک و قوونێرێکە لەئێسکی پەیدا دەبێ.

**ئووفت** (کە.): ئافەرین، نوویفت.

**ئووک:** گەروو.

**ئوولی** (باک.): نهۆمی دووەمی خانووانە.

**ئوونە** (هەورا.): هۆوە.

**ئوویەردە** (هەورا.): بووردنەوە.

**ئووێژە** (رۆژ.): هێرتەی جووتی.

**ئویف:** ووشەی پەسند کردنێیە، ئافەرین.

**ئوویفت:** ووشەی پەسندکردنێیە، ئافەرین.

**نێ:** بەڵێ، نەرێ، نارێ. فەرمانی تەواوکردنێیە واتا، کە کەسێک باخوێ و تۆش بتەوێ ئاخۆتنەکەی تەواو بکات جارجارە پێی دەڵێی (نێ) واتا تەواوی کە بزانین ئەنجامی چی بەسەر دێت یاچۆن کۆتایی دێت. لە زاراوەی باکوردا ئامرازی نێرینانە لەخستنە سەردا، برایێ من، بابێ من، ئاپێ من؛ ئەڤ ڕەز نێ منە: ئەم ڕەزە هی منە. بەس، بیبڕەوە. مرازی نادیارە، نیشانەی نەناسیاری، وەکوو دووێنێ لە باغی ئێمەدا پیاوێ میوەی دەچنی نەشمناسی. قوڵە کراوەوەی ناوی ئێرەوانە بۆ سەرچاوەکانی ئەم فەرهەنگە. ئامرازی خستنەسەر: ــ ێ، زینێ هەسپ، بازنێ زێڕ: زینی ئەسپی، بازنی زێڕی، جێ نێوی، هەیی، هی، نێ؛ ئەم پێنووسە نێ وییە، بۆ پرسیارو سەرسووڕمانیش بەکاردەبرێ وەکوو نێ؟. واتە ئایا بەڕاستییە، لەکاتی باوەڕ پێکردنێدا، کە کەسێک چتێکت بۆ بگێڕێتەوە دەڵێی (نێ) واتە:وایە، ڕاستە.

**نێ نێ:** بەڵێ بەڵێ، نەرێ نەرێ، نارێ نارێ. بەس، بەس بەس، بیبڕەوە.

**نێت** (باک.): ڕان.

**نێتۆن:** کوڕێر، کۆڕە، (دەر.) کور.

**نێتوون** (باد.، باک.): دۆژە، جەهەننەم. قەڵاخێکە دیزە و گۆزەی تێدا سوور دەکرێتەوە، تەندووری گێچی. هاڵاوی ئاووری.

**نێجگار:** بڕوانە: نێگجار.

**نێجگارەکی:** بڕوانە: نێکجارەکی.

**نێجگاری:** بڕوانە: نێجگاری.

**نێخە:** نێقە، بەرزک. لە ــ بوونەوە: لەکوڵبوونەوە. لە ــ کردنەوە: لە کوڵکردنەوە، (باک.) میلوان، پستۆ، بەرستۆ، بەرستۆک. (باک.) بەرسکوڕ، بەستوورک، پێسیر، (زا.) بەندۆک، (ڕەوا.) زیبی، ملیوان. یەقە، یاخە، ستکر، نێقە، بەرزک، بەرچێڵە، شەبەک.

**نێخە وبەرک:** بڕوانە:نێخەوبەرزک.

**نێخەوبەرزک:** نێخەوپێشەسنگ. ــ ی بەدراوی ژنان، بەرە، گۆبەرزک.

**نێخەی کراس:** (ڕۆژ.) میلووان.

**نێختە:** ئەسپی خەساو، بارگینی خەساو، کەڵ و گای خەساو، یەختە. دارەبی ونێتر، کە سەرولق و پۆپەکانی بڕا بن و کورتکرابێتەوە.

**نێخدان:** یەخدان، جوورە سندووقێکی گەورە بوو کەلوپەلی ناوماڵیان تێدا هەڵدەگرت. ڕۆندان.

**نێخستن:** خستن، کەواندن، خستەی. بیخە، بیکەوێنە.

**نێخسیر:** دیل، یەخسیر، بەیدەست.

**نێخسیری:** دیلی، یەخسیری، بەیدەستی.

**نێخنی:** نێغنی، یەغنی.

**نێخنی کێش:** نێغنی کێش، یەغنی کێش.

**نێد** (هەورا.): ئێمە، ئەوە، ئەئەوە.

**نیدەک:** یەدەک، سووار یا کاروانچی، چارەوێیەکی پەتر لە وولاخی سواری و باری خۆیان لەگەڵ خۆیان دەبەن بۆ ڕێگای دوور.

**نێدەک:** یەدەک، دەژ، (باک.) نیردەک، نەردەک، نستوو. شانەی پەتری دەمانچە.

**نیدن** (باک.): نیدی.

**نێدوون:** ئێستا، هەنووکە.

**نێدی:** نیتر، لەمەوپاش.

**نێر** (هەورا.): ئاگر، ئاوور، ئاوێر.

**نێران:** (ئاو.) ئەیری یەنە، نێوی ئافرەتانە.

**نێرانە:** نێرە، نەنێرە.

**نێرانی:** دانیشتووانی نێرانێ، زمانی نێرانێ؛ مەبەسیان تەنها لە فارسییە، ئەگەرچی نێزیکەی چل و چوار زمان و دیالێکتی سەردەمی کۆن و نێوەڕاست و نوێ و هاوچەرخ سەر بە کۆمەڵەی زمانانی نێرانین.

**نێرە:** (شەبە.) نیزا، (باک.) نێرهە، ڤر، ڤێرێ، هر، لها، (جا.، پێن.) ئەگرە، چوندە، (کە.، دەر.، هەورا.) ئەیرە، نێروانە، (لو.) ئیمکە، نێرانە، ئەیروانە، (باک.) لەیرە، هرە، ڤرە. مرازێکە جێگای نزیکی پێنیشاندەدرێ.

**نێرەتی** (ڕۆژ.): بێتین، بێهێز، گێچەڵ، ترکزە، تەلەزگە، دیوارەکە ــ یە: دیوارێکە بێتینە خەریکە بڕمێ.

**نێرەج:** نێوی کوڕی هەرە گچکەی فەرەیدوونییە.

**نێرەق:** هێرەق، هەوجاڕ، هێش. دارێکی دوو پەلە، پەلەکورتەکە گاسنی تێ دەخرێ و پەلەدرێژەکەی مژانەی لێدەدرێت. هەستانی چووی وولاخانە. ــ کردن: هەستاندنی چووی وولاخانە.

**نێرەقان:** یەرەقان، نەخۆشی زەردوویییە.

**نێرەقە:** نێرەقی جووتی.

**نێرەوان:** بڕوانە: نەرێڤان.

**نیردانە** (کە.): نێرە.

**نێردەک** (باک.): یەدەک، نێدەک (وولاخ). (باک.) جوورە ماینێکی سەردەمی پێشووە.

**نێرش** (باک.): هێرش، شاڵاو، پەلامار.

**نێرفست** (باک.): جوورە دارە عەرعەرێکە گەڵای وورد و هەمیشە سەوزە و دڕکاوییە و بێ بەرە، لە چیایەکی کوردستاندا زۆرە.

**نێرگا** (هەورا.): ئاگردان، ئاوورگ.

**نیرۆکووشن** (هەورا.): ئاگرکوژێنەوە.

**نێرهە** (باک.): لێرە، نێرە، (دەر.) لەیرە، (هەورا.) چێگە.

**نێرێس** (باک.): سەرۆکی ئەنجومەنی فەلانە.

**نێزا** (ئەردە.): پاداش، سزای چاکە؛ خووا ــ ت بداتەوە: خووا پاداشت بداتەوە.

**نێزەد:** خولا، خودا.

**نێزدان:** خولا، خودا.

**نێزدی** (باک.): یەزیدی، بەشێکە لەو کوردانەی، کە لە سەر ئایینی زەردەشت ماون نزیکەی سەد هەزار کەس دەبن لە کوردستانی عیراق و سووریە و ترکیە و ڕووسیە دان. لالەش. کە لە نزیک مووسڵە شووێنی دیدەنی وانە.

**نێزدینسەمری** (باک.): جوورە بووزوورێکە.

**نێزگە:** نێستگە، شووێنێکە دەنگ و باسی گێتی تێدا بلاو دەکرێتەوە.

**نێزنگ** (باک.): داری سووتاندنێیە.

**نێزنگڤان:** دارکەر، کەسێکە داری ووشک کۆ بکاتەوە. ــ ی: دارکەری.

**ئێزید:** یائێزەد، خودا، خولاٚ، خوەدی. ــ ی: یەزیدی، یەزدانپەرست.

**ئێسس:** ئێسسە.

**ئێسا:** ئێستا.

**ئێساکە:** ئێستاکە.

**ئێسە:** ئێستا.

**ئێسسە:** ئێسس، ئێش، ئێششە. بزن و مەڕی پێ دەنگدەدرێ.

**ئێسەنێ:** ئێستاکە.

**ئێستا:** ئێستە، وێستا، (جا.، هەورا.، ژاوە.) ئیسە، (فە.) ئەودەمە، یەمە، (باک.) نهوو، وێسا، ڤێگاڤێ، نها، (باک.) نهۆ، نوهۆ، گووژ، (دەر.) هێمانە، هێمە. هەندیگاوێ، هەندیگایی، هەنووکە، نووکە، نهە، هەنگاوێ، نۆکە، نووهە، تازە. تازەکۆکە، نەقۆ. ئەودەم و کاتەیە، کە تۆی تێدای. تا ــ : هەتا نهۆ، هەتا نهە.

**ئێستاکانێ:** ئێستەکانێ.

**ئێستاکە:** ئێستەکە.

**ئێستاکوونێ:** ئێستەکونێ.

**ئێستە:** بڕوانە: ئێستا.

**ئێستەکانێ:** ئێستاکانێ.

**ئێستەکە:** ئێستاکە.

**ئێستەکوونێ:** ئێستاکونێ.

**ئێستەیەوە** (هەورا.): دۆزەرەوە.

**ئێستر:** هەستر، (هەورا.) هێستر، هەسەرە، ئەستر، وولاٚخێکی چوارپەل قەوی باربەرە دایکی ماینەو باوکی کەرە، نە نێری بۆ کەڵ و نە ماچەی بۆ زگ و زا دەست نادەن. ــ ی نێر: نێرەکی، فرە، هێستری نرە. ــ ی مێ: ماچە.

ئێستر

**ئێستردار:** هەسترکێش، هەسترڤان.

**ئێسترسووار:** سواری ئێستری. ــ ی: سوواری ئێستری بوون: ئێسترە شەلە بۆکووێ دەچی؟ ئێسترە شەلە کێوە دەچی؟ گەمەیێکی مندالاٚنەیە، (موک.) هەنگڵەشەلە.

**ئێسترگابیلکە:** جوورە ئێسترێکە دایکی ماکەر و باوکی ئەسپە لە ڕووی ئەوەوە زۆر نابووت و بێ تین و گچکەیە بێ کەڵکە.

**ئێستک:** ئێسک.

**ئێستل:** شارێکی کوردانە کەوتۆتە ڕۆژاوای جزیرو بۆتانێوە.

**ئێسقان** (دەر.، بابا.): ئێسک.

**ئێسک:** (بابا.، دەر.) ئێسقان، هێسک، (جا.، هەورا.) پێشە، (شکا.) هێستی، (باک.) هەستی، (فە.) سنچان، (کە.) سوقان، (دەلو.) سووقان، (سوور.) هێسک، هێستک، (باک.) چەشن، کەشم، نەشم. ــ سووک: خووێن شیرین، ڕەزا شیرین، ڕەزاسووک. ــ ی: خووێن شیرینی. ــ قورس: خووێن تاڵ، کەپەزە، ڕەزا گران، ئێسک گران، خووێن سارد. ــ ی: خووێن تاڵی.

**ئێسک گران:** بڕوانە: ئێسک قورس. ــ ی: بڕوانە؛ ئێسک قورسی.

**ئێسک و پرووسک:** ئێسکی پووک و ڕزیو.

**ئێسکووک** (باد.): ئەسکووێ، کەوچکی گەورەو کلک درێژە لەداری دروستدەکرێ.

**ئێسۆ** (باک.): پەنابا، جێگایەکە با کەم بیگرێتەوە.

**ئێش** (هەو.): ژان، دەرد، گل، ئازار، یێش، سۆ. ــ دار: پڕئێش وکول، ئێرێش، ژاندار. ــ پێگەیشتن: کزان. ــ پێگەیاندن: کزاندنەوە. ــ ا چاڤی: چاوئێشە، چاوکولی. ــ ڕەڤاندن: ئێش سووککردن. لە زاراوەی بڵباساندا: ئیرو ئامووری جووتی کووێستانیانە. ئاش ئاسیا (یەز.، هەڤێر.).

**ئێشان:** ژانکردن، ئازارکێشان، یێشان، دەردکردن.

**ئێشانەوە:** کولانەوە، وەئێشهاتنەوە.

**ئێشاندن:** یەشاندن، کولاندنەوە، ئارهاندن، شەبکاندن.

**ئێشە (ئێششە)** (باک.، بار.): بۆ گەڕاندنەوەی بزن و مەڕان و یا بۆ لێخوڕینیان بەکاردەبرێت.

**ئێشدار:** بەژان. ــ ی: ژانداری، کولی.

**ئێشدەر:** ئازاردەر.

**ئێش دەس و پا:** جومگە ئێش.

**ئێشک** (شن.، ڕەوا.، کە.): پاس، کێشک، (دەر.) هێشک.

**ئێشکچی:** کێشکچی، پاسەوان.

**ئێشکچێتی:** پاسەوانی، کێشکچێتی.

**ئێشکگر** (ڕەوا.): ئێشکەگر، پاسەوان، کێشکچی.

**ئێشکگرتن:** کێشکگرتن.

**ئێشلک** (باک.): فانیلەی پەمۆ و ئیتر لەسەر کراسەوە لەبەر دەکرێت.

**ئێشوو**(کە.): هێشوو.

**ئێش و دەماری:** ئێشی دەمار.

**ئێشین** (باک.): ئێشان.

**ئێغنی:** ئێخنی، یەغنی.

**ئێغنی کێش:** ئێخنی کێش، یەغنی کێش.

**ئیفتادەیی:** پیرێتییەکی لەکارکەوتوو.

**ئیفلیج:** کسێکە شەپڵەی لێدابێ.

**ئیفلیجی:** شەپڵە لێدراوی.

**ئێڤار** (باک.): ئێوارێ، ئێوارە. هێوارە. ــ اوە خووەش: ئێوارەتان باش.

**ئێڤارکی** (باک.): ئێوارەکی.

**ئێڤەر:** هەرامە، هین، رانێک، کابرا.

**ئێڤرست:** ئێڤریست.

**ئیڤریست:** ئێڤرست.

**ئێڤنۆتە** (باک.): لەش پتەو، تەندروست.

**ئێق** (بابا.): قرپ، هێڵنج، (موک.) پەنگاوخوواردنەوەی ئاو، ئاولەبەر ڕۆیشتن.

**ئێقدانەوە:** هێڵنجدان، قڕقێنەدانەوە، شەپۆلدانی قەرەباڵغێکی زۆر، کە لەبەر زۆری پاشەوپاش بگەڕێتەوە. ــ کردنەوە بۆ ڕشانەوە: هێڵنج هێنانە خۆ، ئێقدانەوە، شێهەڵهێنانەوەی شت.

**ئێقلاب:** بەرکوت.

**ئێک:** یێک، یەک. هیچ یەک، هیچ کامێک، هیچ چتێک. هێلکە. ئامرازی نەپەندی(نادیار)ە: چتێک لەبن هۆودارەی بوو نەمزانی چیە.

**ئێکانە:** یەکانە، بەرازی نێرە، (دەر.) برە، (باک.) کوودەڵە بەراز، بەرازی جاحێل.

**ئێکۆ** (باک.): ئەوتۆ.

**ئێکی:** یەکی، یەکێتی.

**ئێکیان:** هیچکامیان، هێکیان.

**ئێکێتی:** یەکێتی.

**ئێگە** (هەورا.): ئێرە.

**ئێگجار:** ئێجگار، یەکجار، هەرەزۆر، زۆر زۆر، گەلێک، فرە، فراوان، ئەختە، یەکجار زۆر. ـــ زۆر: فت و فراوان.

**ئێگجارەکی:** ئێجگارەکی، یەکجارەکی.

**ئێگجاری:** یەکجەلی، بپربپر، بپرای بپر، زۆر و زەوەندی.

**ئێل:** هۆز، حێل، خێڵ، کۆچەر، خێڵسات، عێل.

**ئێلابەرازا:** خێلی بەرازان، کە لە سووریەیە و مەزنی وان مستەفا پاشا بوو.

**ئێلاخ:** کوێستان.

**ئێلاخ:** ئێلاخ

**ئێلاغا** (باک.): لەوەرگە، پاوان، شوێنێکی خۆشەو پڕلەوەڕە لە ژوورووی بازێڕی ماردینیە.

**ئێلام:** عیلام.

**ئێلان** (هەورا.): هێلانە.

ئێلان

**ئێلەقە** (سەق.): ئامورر.

**ئێلەک:** سیخمە.

**ئێڵەگ** (هەورا.): هێڵەک.

**ئێلجاڕی:** کۆبوونەوەی ئێلە تێکڕا بۆ شەڕی دوژمن، ڕەشبگیری، عێلجاڕی، گەلەکۆمەگی، گەلەکۆمە.

**ئێلچی:** باڵیوز، نوێنەر.

**ئێلخان:** ناوی سەرۆکی ئێلییە، بەڵام لە باکوردا ناوی ژنێکییە واتا خانمی ئێلی.

**ئێلم:** چیایەکی سەرقیتە و زۆریش بڵند نیە کەوتۆتە خوارەوەی ڕۆژاوای جزیر و بۆتانێوە کوردان سوێندی پێدەخۆن.

**ئێڵنج** (ڕۆژ.): هێڵنج، دڵتێکچوون و ڕشانەوە.

**ئیلوو** (باک.): باز (باڵندە).

**ئێلوو:** (بل.) دارێکە بەقەدەر ئەسپیندارێکی بڵندو گەڵایەکانیشی وەهی مازووی دەچی، چەند پۆرگێکی دەردەکار لەناو ئەواندا دارێکی تر شین دەبێ گەڵای وورد و باریکە بەرێکی وورد و زەردێنێ دەکرێتە دەمووکانە.

**ئێلووک** (باک.): بروانە: ئێلوو.

**ئێلیان** (هەورا.): هێلانە.

**ئێم** (باک.): ئالک، ئالیک، خواردەمەنی وولاخ و ئاژاڵانە، (باک.) سەوال.

**ئێمە:** (باک.) مە، ئەمە، ئەم، ڕاناوی کەسی یەکەمە لە باری گەلدا.

**ئێمەگەل:** ئێمەمانان.

**ئێمەمانان:** ئێمە گەل، ئێمەو ئەو کەسانەی، کە وەک ئێمە وان.

**ئێمەومانان:** ئێمەمانان.

**ئێمەیچ** (هەورا.): ئێمەش.

**ئێمیدی** (باک.): جوورە هارووپەکە.

**ئێن** (باک.): هەینی.

**ئێنە** (ئەردە.): ئەوێ.

**ئێواران:** کاتی ئێوارێ، سەردەمی ئێواران.

**ئێوارە:** هێوارە، خۆراوا، چراکران، شێوم، شیم و ویرەگا، شام، ئێوارێ، هێوارە (باک.): هێڤار، ئێڤار، هەنگۆر: ـــ تان باش: ئێڤارا وە خووەش.

**ئێوارەباران:** (دزە.) ئێوارەوۆڵ.

**ئێوارەباش:** هێڤارا وەخووەش، باشەڤار.

**ئێوارەکی:** (باک.) ئێڤارکی.

**ئێوارە ووڵ** (دزە.): ئێوارەبارانە.

**ئێوارێ:** ئێوارە.

**ئێواش:** هێواش، هێدی.

**ئێوە** (باک.): ئەنگۆ، ئەوە، هوون، هنگ، هن، هوونگ، (هەورا.) ڤە، هێوە، شمە.

**ئێوەگەل:** ئێوەمانان.

**ئێوەت:** بەخێو، ڕێز، نوودە. ـــ کردن: بەخێوکردن، ئاووڕلێدانەوە.

**ئێوەر** (باک.): چت، باس، دەستاوێژ.

**ئێوەرە:** هێوەرەی گامێشێ.

**ئێوور:** پڕژ، قەڵوەز، تاڤگە، شۆڕاوە.

**ئێوورگە:** پەناگا، پەسێو، داڵدە.

**ئێوورین** (باک.): دامەزراندن، کۆبوونەوە: بێوورە: دامەزرێ.

**ئێه:** ئامرازێکە بۆ زویری و قەشمەری.

**ئێهێ** (خۆ.): ئەوەتا، ئەوەتانێ، ئەها، ئاها، لەکاتی سەرسوڕمانێدا.

**ئێی** (ئێ ی): بۆ هەڕەشە بەکاردەبرێت: ئێی خۆت دەبینییەوە. بەڵێ، دەتەواوی کە، لە کاتێکدا بەکاردەبرێ، کە کەسێک قسێکت بۆ بکات تۆ کە بڵێی ئێی، واتە فەرموو تەواوی بکە دڵم لێتە.

**ئی:** (کەل.، هەورا.) ئەم. ئاوەڵناوی لە مەرە. (باک.) هی، ئێ، یا، هن، هێن، ئازری.

**ئی من:** هی من، ئی تۆ، هی تۆ. ئامرازی خستنە سەرە: دەری بازێڕی ئی مەزن: دەرکی بازاڕی ئی گەورە، لە(سووریە)دا بۆ ئێرینان بەکاردەبرێ: ئی ئاوەدانە لە زگی خۆیدا.

**ئیە:** مرازی تووڕە و قەڵسبوونی دەڵێن: ئیە! ئەوەچ دەکەی.

**ئیبراهیمی:** جوورە مەقامێکە.

**ئیبلیک:** (باک.) کەسمە، کەرسمە، دەردێکە لەنێو لووتی وولاخان دەردێت.

**ئیتر:** (کۆ.) ئیدی، کوڕ، ئیکە. ووتەییێکە بەکار دێنرێ بۆ دەستپەڵگرتن لەشتێک و دەست بە چتێکی کردن: ئیتر گەمەو فشە بەسە ئۆرەی پتر خوورێندنە، جا.

**ئیجا** (باک.): ئەمجا، ئەمجار، ئەوجار.

**ئیجار** (باک.): ئەمجار، ڤێجار، ئەوجار.

**ئیجباری** (موک.): کاتێکی عەجەم سەربازی زۆریایی دەگرت بۆیەکەمین جار لە بیرمە برایە گۆج و محەممەدی ماملێ بەستەی ئیجبارییان داهێنا.

**ئیجیارووەری** (هەورا.): تیشکی خۆر.

**ئیچ قەلا**: یەکێکە لەقەلاتەکانی میری گەورەی ڕەواندزێ، کە کەوتۆتە باکووری شاری ڕەواندزێ.

**ئیخە**: (ئیخخە)، (کە.) حێلە، حێی، جج، ییخە، ییخخە. ووشەیێکە بزن ومەڕی پێ دەنگ دەدرێ بۆ دەرکردنی یابۆ لێخوڕینی. لە ڕەواندزێ بۆ ئاژۆتنی مەڕان بەکاردەبرێ.

**ئیخە ئیخ**: ییخخە ییخخ.

**ئیخدان**: ییخدانی ووشتر.

**ئید** (هەورا.): ئەمە، ئەوە، ئەئەوە.

**ئیدی**: ئیتر، ئیکە، دی، دیکە، پتر، (باک.) ئیدیکە، دن، ئیدن، ئانگو، (باک.) پاشێن، دۆتر. جا، سا.

**ئیدیکە**: ئیتر، ئیدی، دۆتر.

**ئیذ** (هەورا.): ئەمە.

**ئیذەن** (هەورا.): ئەمەیە.

**ئیراق**: عراق. (هەورا.) بەربەرۆچکە.

**ئیربار**: بڕوانە: هیربار.

**ئیرش** (باد.): هێرش.

**ئیڕۆ** (باک.): ئەمڕۆ، ئیمڕۆ.

**ئیڕوو** (فە.): ئەمڕۆ.

**ئیرۆرۆ** (باک.): ئەمڕۆ، ئەوڕۆ.

**ئیریچێ** (هەورا.): ڕاناوی کۆی نادیارە بۆ مێ.

**ئیزا**: پاداشت، سزا، تۆڵە.

**ئیزگە**: بڕوانە: ئیستگە.

**ئیزیرە** (زەن.): دوورێتێ.

**ئیزگل**: بڕوانە: ئیزگل.

**ئیسا**: ناوی نامە ئاسمانیەکەی ئیبراهیم پێغەمبەرییە(د.خ). ئێستا، وێستا.

**ئیسارە**: (باک.) چۆنێتی خانەی دامانە، کە بۆ گەمەی (دامێنێ) دەستدەدات.

**ئیساکە**: ئێستاکە.

**ئیساکونێ**: ئێستاکونێ.

**ئیساکێ**: ئێستاکە.

**ئیسال** (باک.): ئەمساڵ.

**ئیساولا**: لەمەولا، لەمەودووا، لەمەوسا.

**ئیساولاوە**: بڕوانە: ئیسارلا.

**ئیسە** (جا.، هەورا.، ژاوە.): ئێستا، وێستا، هەنووکە.

**ئیسمە** (ڕەوا.): ووشەیێکە بۆ ئاژۆتن و دەرکردنی بزنان بەکاردەبرێ.

**ئیسەتێ**: ئێستاکێ.

**ئیست**: وێستانێکی کەم لە کاتی ئاخۆتن یا کاروبارێکیدا، وێسان، لەنگ کردن، ئارامگرتن، ووچاندان.

**ئیستەیۆ** (هەورا.): دۆزینەوە.

**ئیستەیۆنەوەشی**: ئەخۆشی دۆزینەوە.

**ئیستگا**: بڕوانە: ئێستگە.

**ئیستگە**: وێستگا، ئیستگای رادیۆ و تەلەڤیزیوون، شووێنێکە دەنگو باسی گێتی تێدا بلاو دەکەنەوە. ـــ ی ڕێگای ئاسن: ئەو شووێنانەیە، کە قەتاری لێڕادەوەستێ.

**ئیستیکان**: (دەر.) پیاڵەی چای، پیاڵە، ستەکان، بادەی چای.

**ئیسقایی**: ئەخۆشییەکە.

**ئیسک** (باد.): قرقێنە، نزگەرە؛ هەنیسک تێنە مـن: هەنیسکی گریانم دێ. کوردان بە عیسای دەڵێن ئیسک.

**ئیسکۆتک**: (باک.) هەنیسکی گریانێیە. ـــ تێنە مـن: هەنیسکی گریانم دێت.

**ئیسۆت**(باک.): ئیسیوەت.

**ئیسیوەت**: بیبار، ئیسۆت، (هەورا.) ئاڵەت، (ئەه.) دەرمانگەرم.

**ئیش**: کار، فەرمان. کردار، کردەوە. بێ ـــ : بێکار، دەستبەتاڵ. بۆبێزوبۆیە: قخ، تف.

**ئیشاڵەکە**: سووێندت بەتاڵ بێ، یەکێک کە سووێندێ بخوات و کەسێکی تریش بیەوێ، کە سووێندەکەی بەتاڵ بێ دەڵێ: ئیشاڵەکە.

**ئیشبەدەست**: کاربەدەست، کەسێکە کاروبارێکی لە ژێر دەستیدا بێ.

**ئیشەف** (باک.): ئیمشەو، ئەمشەو.

**ئیشتیا**: مزێج، ئارەزووی خواردن و خواردنەوەمەنی کردن، مگێز، بە ـــ: بە ئارەزوو. بێ ـــ: بێ ئارەزوو. (هەورا.) ـــ وەردە: ئیشتیادەر.

**ئیشزان**: کارزان، لێهاتوو.

**ئیشک**: (باک.) ووشک، ترسی، نسی. (زا.) دارێکی باریکە هەرپارێکی شل بووبێتەوە دارە باریکەکەی لە گوریسەکەی دەهاڵێنن تا بارەکە توندببێتەوە. (بابا.) بەڕوولە دارێکی گوریسی شلبووەوەی بارانی پێ توند دەکرێتەوە.

**ئیشکانی**: ووشکانی.

**ئیشکاووز**: ئیشکاورس، دەغلێکە پێش پەڵە کەوتن چاندرابێ.

**ئیشکاووس**: ئیسکاووز.

**ئیشکەبەند**: ووشکەبەند، سەرمای ووشک. ـــ ی: سەرمایەکی ووشکی وایە داروبەردی پێکەوە دەبەستێتەوە لە بارێکی وادا، کە باران و بەفر نەبارێ.

**ئیشکەر**: کارکەر.

**ئیشکەڕن**: ووشکەڕن.

**ئیشکردن**: کارکردن.

**ئیشکێل**: زمانەپەنجەرە. مرازێکی بچووکە بە بزمارێکی لە چووارچێوەی دەدرێ، کە پەنجەرە بکرێتەوە یا داخرێ بەهۆی وییەوە سەردەگرێت.

**ئیشگوزار**: کەسێکە کاروبار باش هەڵسووڕێنێ.

**ئیش لێهاتن:** کاروبار لە دەستهاتن.

**ئیشن** (فە.): ناخۆتن.

**ئیش لێهاتوو:** کەسێکە کاروبارەکانی زۆر ڕێکو پێک بن.

**ئیشی** (فە.): دەڵێ، دەڵێی.

**ئیفت** (شن.): (بابا.) ئوف، بەهبەهـ، نافەرین.

**ئیکە:** (کۆ.) ئیدی، ئیتر، پتر.

**ئیکلام:** ڕێز بۆ نواندن.

**ئێگجار:** ئێجگار.

**ئێجگارەکی:** ئێجگاری.

**ئێجگاری:** ئێجگاری.

**ئیگرە** (ئەردە.): ئێرە.

**ئیگلە** (فە.): ئیستا، وێستا.

**ئیل:** ئێل.

**ئیلا** (هەورا.): ئەولا.

**ئیلاخ:** کوێستان.

**ئیلان:** هێلانە. پاشگری بچووک کردنەوەیە.

**ئیلاوئەولا:** ئەولاولا.

**ئیلاوئۆلا** (هەورا.): ئەملاوئەولا.

**ئیلۆک** (باد.): هەلۆ.

**ئیلۆن** (باک.): مانگی ڕەزبەر.

**ئیلیانێ** (هەورا.): هێلانە.

**ئیم:** ئەم؛ ئیمڕۆ: ئەمڕۆ، ئیمشەو: ئەمشەو، ئیمساڵ: ئەمساڵ. (باک.) ئالک، ئالیک، (باک.) ئێم.

**ئیمالە:** دەستوور، دەسوور، شیشەدەسوور.

**ئیمجار:** ئەمجار.

**ئیمجارە:** ئەمجارە.

**ئیمچوون:** دەستەیەک ناڵ و بزمارە، مووچەردە بریتییە لە چوار ناڵ و بیست و چوار بزماری ناڵبەندی.

**ئیمڕۆ:** ئەمڕۆ، ئەمڕۆژەیە کەتۆی تێدای.

**ئیمڕۆکە:** ئەمڕۆکە.

**ئیمساڵ:** ئەمساڵ.

**ئیمشەو:** ئەمشەو.

**ئیمکە** (لو.): ئێرە.

**ئینی** (بۆ.، زەن.): ڕۆژی هەینی (باد.) ئینی، (زەن.) دێن، (ئەردە.) ناز، ئەدا، ئان، شۆخی.

**ئینا:** (هەورا.) وا، ئەوا: ــ لاتەوە پەی مەن دەرمانێ: ئەوا دەرمانی دەردی من لە لای تۆیە.

**ئینان** (باک.): هێنان. (باک.) ــ دن: هێناندن.

**ئینە:** (زەن.، کە.، هەورا.): ئەمە لە تۆ نزیکە، لە زاراوەی (بار.) دا بۆ کۆییە: ئینە من: هینەکانی من.

**ئینەشا:** ئەوەتانێ، ئە ئەوەیان.

**ئینج:** دووازدەیەکی فووتێکە.

**ئینجا:** ئنجا، ئیتر، ئەمە، ئەمەئیتر.

**ئینجار** (هەورا.): ئەوجار.

**ئینجارە** (زا.): ئەمجارە.

**ئینجاکوو:** ئنجاکوو.

**ئینجاکونێ:** ئنجاکونێ.

**ئینجانە** (هەو.، هەورا.): سووڕێنە، تەبەک، گوڵدان.

**ئینجەوفینجە:** هەوا و دەماری بێ جێ.

**ئینجیانێ:** (هەو.): مووروانێ، مووروێنێ، جوورە گەمەیێکی منداڵانە بە مووروروی دەکرێ.

**ئینجیل:** کتێبی پیرۆزی دیانانە. چوار ئینجیل هەیە: مەتی، مەرقوس، یوحەنا، پەتروس.

**ئیندا** (شەب.): ئێرە.

**ئیندە** (هەورا.): ئەوەندە.

**ئینزان:** ئینسان.

**ئینگلیز:** ڕەگەزی ئینگلیز.

**ئینگلیزی:** ڕەگەزی ئینگلیزی، زمانی ئینگلیزی.

**ئیننە:** (هەورا.) ئەمەتا، ئەمەتانێ.

**ئینوو:** هەینی.

**ئینی** (باد.): هەینی.

**ئینێلە** (زەن.): ئەمانە، ئەوانە.

**ئیو** (باک.): ئامرازی سەر سووڕمانێیە. ــ چت لێهاتووە.

**ئیوان** (باک.): هەیوان.

**ئیوەر** (زا.): ئەوکێ.

**ئیوهێ:** لە کاتی کایەی جگێنێدا بەکاردەبرێ.

**ئییار:** کەوڵی وولاخ و ئاژاڵانە.

**ئییە:** مرازی تووڕەبوون و کاتی قەڵسییە، دەڵێن: ــ ئەوە چ دەکەی، ئەمە، ئەوە.

# ب

**ب:** تیپێکی ئابێی کوردییە. (باک.) بــ: بە: بجارەکی: بەجارێکی، بتەنێ: بەتەنێ. بۆ فەرمان دەچێتە سەر ئامادە و نەدیو: بخوێنە، بخوێنێ. کە بچێتە سەر چاوگە دووای فرێدانی ئامرازی چاوگە دەیکاتە بکەر: بنووس، بکەر، بخۆر، بڕێژ.

**با:** قوڵـه کـراوەوەی نـاوی (بابـان)ە بـۆ سـەرچاوەکانی ئـەم فەرهەنگـە. (هەورا.) ڤا، وا، (دەر.) هەوا کە بای بێ لقـی داران و سەری گیایانیش دەهەژێنێ، بای زریان: بایەکە لە باکوورەوە بێت، بای شەماڵ: بایە کە لـە باشوورەوە بێت، (باک.) بایێ بێرین: بـای ڕۆژاوایـە. بـا (ڕۆمـاتیزم): نەخۆشییێکە لەبەر چـەند هۆیـەکی لـە ئـەژنۆ و پشت و شان و قۆڵـی مـرۆی دەدات. بەڵێ، باڕاستە، لە کاتی شێواز و باوەڕ پێکردنێدا بە کـاردەبرێت. ئامرازی فـەرمان و تێڕاخوڕینـە بـۆ کەسی سێیەم لـە باری تاکی گـەلیدا: بابڕوا: بلابڕوا، بابڕۆن: بلابڕۆن. دەبا. دەجا، بلا، دە، دا، دە. لـە کاتی بەرژەوەندی و یەکێتی و ڕێککەوتنێدا بەکاردەبرێت: با بچین، دەبابچین، با ئەمشـەولێرەبین: دەجا ئەمشـەولێرەبین، بابچووبایی، با بێتـەلام. وا، فاڵ: بەبا، بەفاڵ. کن: نک، لا، لەگەڵ: لباوی: لە نـک وی، لـەلای وی. بانک، گاز: با ــ کرن: بانک کردن، بای کە: بانگی کـە. مـا باکـەی؟ : بۆ چی بانک دەکەی. ڕیشە: ڕەگ. لـــ لڤان ئانی: ئێمە ڕیشەمان دەرهێنـا. سوود، قازانج، بای تۆیە: قازانجی تۆیـە. باخسـتن: خسـتنی بـا، نـەمانی با. یەکێکـە لـە چـووار هۆیـەکانی ژیـانێ وەکـوو: ئـاو، ئـاوور، خـاک، بـا. دیڵەسـەگ و گـورگ و چەقـەڵ کـە هـەوای جـووت بوونیـان بکـەوێتـە سـەری پێیـان دەڵـێن دێلەبـەبا. بـۆ مـەڕ و بـزن: تەگـە بـۆ مـاین و ماکـەر(فـاڵ یـا تەڵـەب) بۆمانگا؛ مانگا بەکەڵ بـەکاردەبرێت، توانـایی جـووت بـوون، شـەهوەت. ــ یـێ بـاکوور: بـای شـەماڵ. ـــ ی سـەخت: ڕەشـەبا. ـــ ی سەموور: بای سموور هی ڕۆژ هەلاتێ. ــ یێ خور: بای ووشک و بە هێزی ڕۆژاوایە. (باک.) ـــ یـێ بێرین: بـای ڕۆژاوایـە. ـــ ی تـەڕ: (بـاک.) سازاخ. ــ یێ دوورژوونییە: بایەکە بارانەی بێنێ. ــ یێ ڕەش: ڕەشەبا. ــ یێ ژێری: بایەکە لە دەشت یا لـە دۆڵـەوە بێت. (باک.) ـــ یـێ کـوور: بـای شەماڵ. ــ یێ گوڕ(باک.): بای سەخت. ــ ی نیوەڕۆیە: ڤای وەشت، بای باکوور.

**باء:** بالـەی مـەڕانە.

**بائەمە:** ئەگەرچی، لـەگەڵ ئـەمـش.

**بـاب:** بـاووک، (ڕەوا.) بـاو، (بـاک.) بـاڤ، (هـەورا.) تاتـە. شـارێکی کوردانە لـە باکووری شـاری حەڵـەبێیە.

**بابا:** (بـاک.) بابـە، بـاوە، باوکـە، بـاوکۆ، (هـەورا.) باپـیر، بابەگـەورە. (هەورا.) ــ پیاڕە: زڕباب. بابای عوریان.

**بابا پیارە** (هەورا.): زڕباب.

**باباڕەخ ئەلهە مەزانی:** مـەلا ئەنوەری مـائی دەڵـێ ـــ هەسـتیارێکی کـورد بووە.

**بابان:** باوان، مـاڵی دایک و باب. بنەمـاڵـەییێکی پادشایی کورد بووە، لـەم دوواییەدا لـە شـاری سلێمانی و خـاکی شـارەزووردا، کـە لـە بـەرەی فـەقێ ئەحمـەدی دارەشمانـە و لـە بنچینـەدا موکریانین باپـیرە گـەورەی وان، کـە ناوی بوداغ سوڵتانە، ئێستا ئارامگای لە باشووری شاری سابلاغێیە.

**بابانە:** (باک.) باوینی.

**بابان ئاوا:** ئافرەتێکە خاوەندکەس و کاربێ.

**بابان وێـران:** (ڕەوا.) بابـانکۆر، مـاڵـەدایک و باب و کـاوول، ژنێکـە بـێ کەس و کاربێ.

**بابانی:** جوورە پارچەییێکی جووان و نرخدار بووە بە ناوی خانەوادەی بەرزی بابانەکانەوە ناو نراوە.

**ببە:** باووک، باوکە، بابا، (هەورا.) تاتە، (ڕەوا.) بـاوە، (بـاک.) بـابۆ، لە کاتی بانگ کردن و یا لـەگەڵ ئاخۆتنێدا بە کاردەبرێ.

**ببەت:** تەرز، چەشن، باوەت. ژنـی جووان، پیاوی جووان. لایـەن. لـە ــ چیەوە؟ : لە لایەن چیەوە؟. بارە. لە ــ : لە بارەی.

**ببەخولێ:** گەمـەییێکی منداڵانەیە بە گردی خۆیاندا دەخولێنەوە.

**ببەخوون** (هەورا.): بارەخۆن.

**ببەژەنی** (هەورا.): باوەژن، زڕدایک.

**ببە عـەمرە:** بـۆ کەسێک بـە کـاردەبرێت، کـە بـە دیـەن منـداڵ و بـەڵان بەتەمـەن بێ.

**ببەگەورە:** باپیر.

**ببـەلیچ** (پـاد.، نـە.، شـک.): براتووتەڵـە، قامکەکـەی تەنیشـت توو تەڵـەیە.

**ببەلیچک** (باک.): کارەساتی ساڵانە، بە سەرهاتی ساڵانە.

**ببەلیسک** (باک.): تۆز و با، گێژەڵووکە. سەدە.

**ببەلیشک** (باک.): تڕتڕۆک، بۆڕی خوواردنێیە.

**ببرا:** برای باب، زڕبرا، باوک برا، باڤ برا، باوبرا، براباب.

**ببدەست** (باک.): هـەژار، دەسـتکورت، نـابووت، بـێ پـارە. (بـاک.) ــ ی: هەژاری، دەستکورتی.

**ببردوو:** هەر چتێکی سووکی بابیبات ــ ی پێ دەڵێن.

**بـابردی:** میوەییێکـە بـابردبێتی وەکـو هـەنجیر و هـەنارو ئیـتر. جـوورە پارچەییێکی تەنکی گوڵگوڵییە وەک شێلە.

**ببزەن** (فە.): بارێشک.

**ببک** (باک.): تیرە، بەرەباب، ڕەچەڵەک.

**ببل** (باک.): بابول.

**بابلابک** (باک.): جوورە گیایەکە بەدار و دیواران هەڵدەچێ.

**بابلووسک** (باک.): سەدە، سەردەم.

**بابلیچک** (باک.): قامکە تووتەڵە.

**بـابن** (بـاک.): ڕەگ و ڕیشـەی پزشـکێتی، بنچینـەی پزشـکی. گوڵـە بابوونە.

**ببۆ** (باک.): بابە، هۆی بابـە، بـاوە، تاتـە، باوکـە، لـەکاتی ئاخۆتن و یا بانگ کردنی بابدا بە کاردەبرێت.

**ببۆر:** بابۆڵـە. دەلینگی هەڵپێچراوی ژنە ڕەوەندانە.

**ببۆرە** (خۆ.): بابۆڵـە.

**ببۆس** (باک.): ناوی خێڵێکی کوردانە کەوتۆتە ناو خەزرانانەوە.

**ببۆڵـە:** (هـەورا.) قەپاڵـە، (خـۆ.) بـابۆرە، (دەر.) بالوولـە، مامـە حووچێ، پارووی نانی درێژ و پێچراوەوەیە.

**ببووڵەپێچ:** پەتێکە مـەلۆتکەی پێدەپێچرێ، دەسڕازە.

**ببووتان** (باک.): بڕوانە: بابووتانێ.

**ببووتانێ** (باک.): جوورە گەمـەییێکی جۆلانەیە.

**ببووڵە:** مـەلۆتکە، قۆناخە، قۆنداخە.

**بابوونە:** گوڵە فەقێ، گوڵە چاوێشە، بەیبوونە، گیایەکی بەهاری بۆنخۆشە گەڵاکانی وەهی شوویتی دەچێ گوڵێکی خڕی زەرد دێنێ بکرێتە چا بۆ هەڵامەت و زگ ئێشە باشە و بە ئاوەکەی برینی خەرکانەی منداڵانی پێ بشۆرێ سوودی هەیە.

**بابووهێر** (باک.): پەنا، پەسیو.

**بابووێر** (باک.): جێگایەکە با نەیگرێتەوە، (باک.) بابهێر. پەنا، پەسیو، بادرز.

**بابهێر** (باک.): بڕوانە: بابووێر.

**بابێ** (باک.): بابۆ، بابە، باڤە، باوکە، (سۆ.) بابێ، بلابێ، بەلابێ.

**بابێ بابێ:** خازەڵێن، جوورەگەمەیەکی منداڵانەیە و دەڵێن: بابێ بابێ حەمەدەی برابێ، تەقڵەی لە چەندان دابێ.

**بابی بابی:** گەمەیەکە دەستەیەک سووار دەبن و بە دەست چاویان دەگرن وەستاکەیان بەسەرو پۆتراکی ئەوەیاندا دەماڵێ کە خۆی سوواری بووەو دەڵێ (بابی بابی لە چەن بابی) و لەو کاتیدا قامکێکی بەرز دەکاتەوە ئنجا ئەوی ژێرەوە ئەگەر هەڵی هێنا دەستەکەی وی دەیبەنەوە و سووار دەبن و ئەو کەسەش دەبێتە وەستا.

**بابێتی:** (باک.) بابینی، بابیتی، باوکی، باوکێتی.

**بابێر** (خۆ.): جێگایانی قوول و پەناوپەسیوی ناوکێو ئاوەدانیانە، کە باپری کردبێتەوە لە بەفر. باپێچ.

**بابیتی:** بڕوانە: بابێتی.

**بابیزۆک** (باک.): سێلاو، لافاو.

**بابینی:** بڕوانە: بابێتی.

**بابێتی** (ئەردە.): هەڵامەت، درم، پەتا.

**باپەر:** چاپانێ، (هەورا.، دەر.) واپەڕ، کەسێکە لە کاتی ئارەقەکردنێدا کە هێشتا ئارەقەکەی ووشک نەبووبێتەوە بای ساردی لێ بدات.

**باپەری:** بارێکە لە پێش ئارەقە ووشک بوونێدا بای سارد لە لەشی ئارەقە کردووی بدات.

**باپشکێو:** (کە.) سێتکە سەلاو، (دەر.) سیسکەسەلا، (هەورا.) قنچکەسلاوە، چنچکەسلێمانە، (هەر.) دیقلۆک، (کۆ.) سیچکەسلاوە، (هەو.) سینچکە، (بار.) فزدۆک.

**باپووسکە** (ئەردە.): خۆڵەمێشی قاقەزی سووتاوە، کە با بیبات، مشکی.

**باپووک** (باک.): کرێوە.

**باپێچ** (باد.): با و بەفرێکە پێکەتێک باوێن و گێژی تێدا بخوا لە شوونێکی قوول یا چەپدا. بەفرێکە با لە جێگایەکیدا کۆی بکاتەوە. (باک.) باربەست. ــ کرن: باربەستی. پێچێکە لەبەر زگی مرۆڤاندا بێ.

**باپێچک** (باک.): کرێوە، بای دوورژوونیە. شڵێوە، بارین بارینە و بەفر پێکەوە.

**باپێدان:** پێچدان بە چتێک.

**باپێش** (باک.): چاوئێشە.

**باپێشک** (باک.): بای بارانە.

**با پێ کردن** (باک.): پەرچڤاندن، هەڵامساندن.

**باپێلیسک** (باک.): گەردەلوول.

**باپیر:** پیرەباب، بابا، کالک، باوا، بابی باوک و دایک.

**باپیران:** کال و کالک.

**باپیرە:** باپیر.

**باپیرەگەورە:** باوکی باپیر، باوەگەورە، باوگەرە.

**باپیری** (باک.): جوورە هەنارێکە مزربێ و ترشی زۆرتر بێ.

**باپێش** (باک.): پزشک و تیمارگەری چاوان. (باک.) ــ ی: پزشکی و تیمارگەرێتی چاوان.

**باپێڤان:** تەنبەڵ، هەتیوچە.

**باپێڤانی** (باک.): تەنبەڵی، هەتیوچەیی. ــ کرن: تەنبەڵی و سستی کردن.

**باپێکردن:** هەڵامساندن، پەچڤاندن.

**بات:** جیات، بری، زانەوێر، لەباتی: لەجیاتی، لەبری، زانەوێر، برێتی، گوندێکە لە ژۆری شاری (مدیاد) دایە ڕەنگە مەلای باتەیی خەڵکی وی بێ.

**باتانی:** بەتانی، جاجم.

**باتەقا:** بارتەقا، بەقەد، بەئەندازەی.

**باتزۆک** (باک.): مرۆی خونکی بێ شەرم و شوور.

**باتسە:** بڕوانە: باتسکە.

**باتسکە:** هەنجیری بێ تام و نەگەیشتوو، کەڵبەهەنجیر.

**باتسمی:** جەژنێکی گەورەی یەزیدیانە.

**باتشمی:** جێژنێکی یەزیدیانە، کەوتۆتە چووارشەمەی هەرە دووایی مانگی دێسەمبرێوە.

**باتک** (باک.): ئەسکووی، کەوچکی گەورە.

**باتلاخ:** (ئەردە.) زق، زلقە، زناو، زنەک، زۆنکاو، چورتم، زەوی ئاودار.

**باتمان** (هەو.): پووت. بالیفە.

**باتۆ:** بڕوانە: باتوو.

**باتۆڤ:** جوورە گیایەکی سوورە.

**باتوو:** باتی، باتۆ، هێلکەی گون. لە پەردەی شێوازدا بۆ گونیش بە کاردەبرێ. (باک.) ئێلێکی کوردانە لە ژووررووی خاکی بۆتانێدایە.

**باتێکردن:** هاندان، پف تێکردن، هەڵنان، فووتێکردن. شووتی دەبن هەنگڵدان، لاسدان.

**باتی:** برێتی، لە جیاتی، لەبری. (باک.) بڕوانە: (باتوو.).

**باتیزۆک** (باک.): بێ شەرم، چەتاوەڕوو، ڕووهەڵماڵراو، بێ ئابڕوو.

**باتینک** (باد.): خونچەی تازە پشکوتوو.

**باتینۆک** (باد.): گولاڵە سوورە.

**باج:** خەرج و باج، میری، ڕادارانە، خەراج، خاراج، خووە، خووێک، (باک.) مەکات، باج بێش. باژ، بارانە، پاسەوانە، دەروازەوانی، (باک.) پاس، زێڕەسەر. ــ ی گومرک: ئەوەیە کە گومرگ لە سەر کالای بێگانانی دا ناوە و لە سنوور لێی وەردەگیرێت، کرێی تێپەڕین، گمرک. ــ ی سەر: سەرانە، زێڕەسەر، پارەیێکە لە لایەن دەستەلاتدارێکەوە لە باران دەستێنرێت.

**باجان** (باد. ، باک. ) : باینجان و تەماتە. ـــ ی ڕەش: باینجان. ـــ ا سۆر: تەماتە.

**باجە:** قەفەزەییێکە لە بانک وسینەماو شەمەندەفەردا یەکێکی تێدا دادەنیشیێ چەک و بلیتی تێدا دەبڕیێ. رۆچنە، کولانە، واجە، کوناواجە، کوناوەجە.

**باجەڵان:** پارچە خاکێکە لە نێوانی مەندەلی و خانەقینێدا و لەسەر ئاوی ئەلوەندێیە.

**باجەلانی:** تیرەیێکی کوردە لە خێڵی لورلور لە خاکی باجەلانیێ دادەنیشن، راوێژی ئاخەفتنیان زۆر لە هەورامی دەچی.

**باجەوان:** باجکر.

**باجگە:** شوێنی باج لیێ وەرگرتنیێ.

**باجگر:** باجگیر، کەسێکە باجی کۆبکاتەوە.

**باجگرتن:** باج وەرگرتن، باج سەندن.

**باجگری:** باج گیری.

**باجگیر** (فە. ) : باج ئەستێن، کاربەدەستی گومرگیێ، باجگر، باجەوان، ڕادار. (فە . ) ـــ ی: باج ئەستاندنی گومرگ، باجگری.

**باج لێگرتن:** باج وەرگرتن، باجگیری، بە ناخونەک باج و چتێک لە چتێک وەرگرتن.

**باجووا** (دزە. ) : ئافرەتێکە بە یەکێکی تر گۆڕابێتەوە، واتا ژن بە ژنەی پیێ کرابیێ.

**باجوولا:** ئێلێکی کوردی یەزیدییە لە ناو (هەڤیرکا )دا.

**باجووج** (باک. ) : گەمەو شۆخی کار.

**باجی** (باک. ) : ئەندازە و پلەی مۆزیقە.

**باجی سەربار:** سەربارانە.

**باچ** (باک. ) : باج.

**باچە** (شەبە. ، زەن. ) : بلێ.

**باچک:** گەنمە شامی سوور، زەڕاتەدێمیلە.

**باچۆ:** (باک. ) کاکە، برای گەورە.

**باچیک:** هەرزن، گاڵ.

**باخ:** شوێنێکە داروودرەختی بەری و بیێ بەری زۆر تێدابیێ. باغ، (باک. ) دەهل. ڕنینی باخ وباخچە: دارم.

**باخە:** باغە، جوورە مووروویێکە. باقە، چەپک، دەسکی گیاوچتی درواو.

**باخەڵ:** دەرباخەڵ، باخڵ، باغەڵ، بەخەڵ، (هەورا. ) باشیل. (بۆتا. ، گۆ. ) پزیی. گەوەڕ. (هەورا. ) گیرفان.

**باخەڵە** (هەورا. ) : گیرفان.

**باخەڵبڕ:** گیرفان بڕ.

**باخەوان:** باخڤان، باغەوان، هۆلکڤان، (باک. ) باخڤان. دارکولی، کەسێکە کاروباری باخی هەڵسووڕێنی. ـــ ی: باغەوانی، باخڤانی.

**باخ بڕین:** باخ بڕین وبڕینەوەی باخ.

**باختن:** لەدەست چوواندن، دۆڕاندن.

**باخچە:** بخچک، پالیر، لاتک، (باک. ) پاریز، باخی چکۆڵە.

**باخچەوان:** باغچەوان، باخچەڤان.

**باخچەی ساوایان:** باخچەی منداڵانی گچکە. قوتابخانەی ساوایان.

**باخچەی گوڵان:** گوڵستان، گوڵزار.

**باخچەی منداڵان:** (باک. ) سەلیلاتک.

**باخدا:** خاوەندباخ.

**باخرز:** شارێکی گچکەیە لە ناو وولاتی (خەرزا. ) دا لەمژۆری شاری هەسکیفییە.

**باخڵە:** دووکانی شەتڵ، پارچە زەوییەکی گچکەو خۆشکراوو کێڵراو و زبڵ تێکراو، کە تۆوی هەرچتێکی تێدا بچێنریێ دووای سەردەرخستن وکەمێک بەرزبوونەوەی پێی دەڵێن شەتڵ چوونکە لەویێ دەگوێزرێتەوە بۆ ناودێراو یا زەوی ئامادە کراو. دەفرێکە تۆوی تێدا دەبرێت بۆسەر وەردان بۆ وەشاندنی.

**باخۆر:** بادرز.

**باخۆش:** باوخۆش، ساخ، خۆش، گەورە.

**باخۆشە:** دارێکە دۆکولیو و هەریسەی پیێ تێک وەردەدریێ.

**باخۆشتر:** گەورەتر، ساختر، باوخۆشتر.

**باخوواردن:** پێچ خوواردن.

**باخووە** (باک. ) : بدوویێ، قسە بکە.سەرۆک.

**باخووەر:** ماوە، ماودا، دەرفەت.

**باخوشە:** بڕوانە: باخۆشە.

**باخیێ:** فەلان بە گەورەی خۆیان، کە کورد بیێ دەڵێن ـــ هەر وەکوو هیندی بە ئینگلیزان دەڵێن ساحب، کەچی لە هەوراماننیێ هەر چەندە فەلەشی لیێ نیە هەر بەکاردەبریێ.

**باخیر:** وەڵام دەر، ڕاگەیێن، پیێ ڕاگەیێن، ئاگادەر، ئەوکەسەیە ئاگا و وەڵامان ڕاگەیەنیێ.

**باد:** توویێ، تاک، تەنها، یەکباد، یەکتوویێ. ژاوە، فە، با، ( دەر. ) وا.

**بادار:** (هەورا. ، دەر. ) ڤادار، وادار، (دەر. ) واووڵ، کەسێکە بای لە ئەندامی دابیێ. باهێنە. هەوادار، بادی هەوا.

**بادارۆک** (باک. ) : جوورە پارچەیێکی پەنجەرە پەنجەرەیە و تاوا چنراوە. جوورە قردێلەیەکە لە سەری منداڵان دەدریێ.

**باداری:** (دەر. ) واداری، نەخۆشیەکە لە چۆک و سەرشان و پشتی مرۆی دەدات. بایی. وینک. بێوەسیری.

**بادارێتی:** باری باداری.

**باداک** (ڕۆژ. ) : بەرز بوونەوە و هەڵچوونی دار، (زا. ) گیایەکە بە دار و درەختاندا هەڵدەچیێ.

**بادام:** (باد. ) باهیڤ، بەهیڤ، (هەو. ) باوی، بادەم، لرز، قەوارژک، چەقیلە، چەقالە، چووالە، بایەو، بایام، پیام، دەیندک. سەری داری بادامییە. داری ـــ ی: (باد. ) دارا بە هیڤی.

**بادامەتاڵە:** بادامی تاڵ، هەرجن، داری بادامی تاڵ.

**بادامچە:** چەقالە.

**بادامی:** چتێکە وە چەشنی بادامی بچیێ.

**بادامی تاڵ:** شرت.

**بادامی شین:** گولهە.

**بادامی کێوی:** بادامەکێویلە، باویەتالە، چوالەتالە، چەقالە، چوالەشینکە، بایەف، کالەشین، شەوالشینک. بە بادامی تەڕو ووشکی کێوی و بەدارەکەشی دەڵێن بادامی کێوی.

**بادان:** ڤادای، (هەورا.) وادای، (لوڕ.، فە.، دەر.) وادان، چەقاندن، (باک.) زڤڕاندن، پێچدان، هلچناندن، تاودان، زۆر بادانی بەن و دەزوو و ئیتر، کرژکردن. بابدە: پێچدا. بە باکردنی گەنم و چتی تر.

**بادانەوە:** بادانی دوو ریس کردنیان بە یەک هەودا. گەڕانەوە، وەرسووڕانەوە، وەرگەڕانەوە، وادانەوە، بانین، چۆپکردنەوە. پەشیمان بوونەوە، پاشگەز بوونەوە. (دزە.) کەناری پارچەیێکی خڕ بادەدرێ و لوول دەدرێ و دەدرووێ. (هەورا.) هەڵنووچاندن، (موک.) نوشتەوا، داگیرانەوە.

**بادەوە:** بادەوە.

**بادایی** (باک.): بادراو، باخواردوو.

**بادە:** ئیستیکان، پەیمانە، پیاڵەی ئاوخواردنەوە، پیاڵەی مەی. مەی.

بادە

**بادەبادە:** پیرۆز بێ.

**بادەچی:** مەیفرۆش، مەیگێڕ.

**بادەر:** وادەر، لوولدەر.

**بادەرەوە:** پەشیمان، گەڕاوەوە، پاشگەز.

**بادەرچوون** (ئەردە.): برێتییە لە لووت بە بەرخۆدا هاتنەوە و تا سەرشۆڕکردن و واز لە فیز و هەوا هێنان. دەرچوونی با، لێ بەربوون.

**بادەرکردن:** دەرکردنی با.

**بادەفرۆش:** مەیفرۆش.

**بادەڤ** (باک.): کرێوە.

**بادەک** (باک.): پێچ بادەر، بورغی بادەر، مرازێکە بورغی و پێچ و چتی تری پێ بادەدەن.

بادەک

**بادەم:** بادام.

**بادەوان:** پەردەی کەشتی.

**بادەوە:** بەرزە هەوایی، بەرزە حەوایلە، (ئەردە.) بەرزە هەوایلە، (هەورا.) کۆلارە، (باک.) فرفرۆک، تۆف و سارد و سەرما.

**بادران:** کرژ بوونەوە، هلچنران.

**بادراو:** وادراو، کشت بادراو، بەباف.

**بادرەنگ** (ئەردە.): گیایەکی بۆنخۆشە بە پەنیرەوە دەخورێ.

**بادرەنگ بوویە:** بڕوانە: بادرەنگ.

**بادرخان:** جوورە گیایەکە.

**بادرز:** درزی زۆر باریک لە چتێکی.

**بادروو:** پۆپەی کەڵەباب.

**بادریاگ:** بادراو، تاودریاگ.

**بادرێزە:** بەری پووچەڵ و ناپەسند و یا ئەوانەی کە ناگەن و با لە دارییان دەکاتەوە، بارێزە.

**بادرێسە:** بڕوانە: بارێسە.

**بادک:** خێڵێکی کوردانە لە زۆری خەزرایە، لە زۆری وولاتی بۆتانە گەلێک جاران پارس (دەرزۆزە)ی دەکەن.

**بادگژە:** بڕوانە: باگژە.

**بادگیر:** جوورە موغەیرێکە لە ساردوایێدا وە لە هێندێک کۆشکاندا دروست دەکرێ بۆ باکێشی هاوینان.

**بادلا:** ئیلێکی کوردانە لە زۆرور خەزرایە.

**بادنجان:** باینجان.

بادنجان

**بادوە** (ئەردە.): کرێوە.

**بادی:** ترار، قاپ، بایە، مەن، بادە، جامی ئاوی یا هی مەی خواردنەوە، (بار.) ترگال، جامی ئاوخواردنەوە، (باک.) باداری، ڕۆماتیزم.

**بادیە:** جامی گەورە، قاپی مس.

**بادیلە** (خۆ.): جامی چکۆلە، جامیلکە، (خۆ.) بادی، قاپی ئاو خواردنەوەیە.

**بادین:** زێیەکی گەورەیە لە نێوانی هەولێر و موسڵدا. (باک.) کاسە، بادە.

**بادینان:** هەرێمێکی کوردستانە ئەم شارانەی تێدا هەڵکەتوون: ئاکرێ، ئامێد، دهۆک، زاخۆ، عەین سفنی. ناوێکی کۆنی ئایینی زەردەشتییە لە بنچینەدا (بەهدینان)ە واتا باشترینی دینانە ووشەی دین کوردییە، ئاتەشکەدەیەکی گەورە لە ئاکرێ هەبووە.

**بادیناوا:** نێوی دێیەکییە لە ڕۆژهەلاتی کێوی قەندیلییەوە و ئەو چۆمەی لە وێوە پەیدا دەبێ بە نێوی وییەوە نراوە.

**بادینی:** ئەو کەسەی لە ناوچەی بادینان بژی.

**بادی هەڤا:** بادی هەوا. ـــ یی: بادی هەوایی.

**بادی هەوا:** بایی هەوا، خۆبین، بەهەوا، بادی هەڤا، بێ سوود، بێ جێ، خۆڕا، مفت، هەرزان، خۆڕایی و فیرۆ. ـــ یی: بادی هەڤایی، بێ سوودی، بێجێیی، خۆڕایی، مفتی، هەرزانی، خۆبینی، بەهەوایی.

**باڕ:** جحێل، بە بێچووی باڵندە و پەڕەووران دەڵێن، بارەکەو، (هەورا.) گوواری.

**بار:** قوڵەکراوەوەی ناوی بارزانە بۆ سەرچاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە. دە پووت (باتمان) بارێکە. دووتا، دوولنگەبار، دوولابار. (باد.) بەندەک، هەر چتێکی بە پشتی وولاخی هەڵگیرێ باری پێدەڵێن. کۆچ و بار. ـــ برن: دڵنیابوون. دەربەست، دەربەند، یارمەتی. خووەنەدابن بارێ مەن: یارمەتی نەدام. ژ خووەراکرن بار: دەربەست و دەربەندبوون. توانایی: لە بارمدانییە، توانام نییە، لەباربوون: لە توانا و دەستەلاتا بوون. باری زمان و لێوان: بە لغێکە لەبەر نەخۆشی و یا هیچ نەخواردن لەسەر یان پەیدا دەبێ. دۆخ: چلۆنی، چلۆنێتی، پاودان، ڕەخ، سنوور، دۆن، ڕەویەت، سەروسەکەت. کۆک: بارکردن، کۆک کردنی کاتژمێر، دانانەوە. ـــ کردن: کۆچکردن، ڕۆیشتن. (باد.) بەش، بەهرە. پیلۆس، سیپاڵ: خۆڵێ کردنەبار، خۆڵێ کردنە پەلاس. (باک.) نووکی قامکی. بووار، بوورینگە. سەرەوخووار. ساختە، عەیار، غەش، دەغەڵ. کار، کاروبار. بەری داران. نەخۆشی: لەش بەبار. بەر، زگ، منداڵ. دەستوور، ڕێ و شووێن.

**بارسیاو** (دەر.، هەورا.): باراش.

**بارسیاوهەڕ:** باراش هاڕ. باراش هێڕ.

**باراش:** (دەر. ، هەورا.) بارەسیاو، باراسیاو، (زا.) هێڤران، ئەوەندە دانەوێڵەیە، کە بۆ هاڕینی ببرێتە ئاش.

**باراش لێ کردن:** باراش لە ئاشیدا ووردکردن. درێژە بە ئاخۆتنێدان.

**باراش هاڕ:** باراش هێڕ، (هەورا.) باراسیاوهاڕ، (زەن.) بارەسیاوهاڕ، ئاشەوان، یا خاوەند باراش.

**باراش هێڕ:** (هەورا.) بارە ئاساوهەڕ، (زەن.) بارەسیاوهاڕ، باراش هاڕ.

**باراڤ:** ئێلێکی کوردانە لە دەشتی دیاربەکرێدا و لە خوارەوەی زێی دەجلەیە.

**بارام:** نێوی نێرینانە، ناوی ئەستێرەی (مەریخ) یشە. ڕۆژی بیستەمی هەموومانگێکی ڕۆژی (شەمسی)یە.

**باران:** ئەو تنۆکە ئاوانەیە، کە هەور بەسەر گۆی زەویدا دەبارێنی دەخڵ و دان و گژ و گیا و باغ و باخچەی پێ تێراو دەبێ، (دەر. ، فە.) واران، (هەورا. ، زەن.) ڤاران، وەشت، بارین. ــ بڕان: بارانە ڕاوەستان، (موک.) کەمژکردن، جۆزەردان، نێوی مانگی دوایی بەهارییە. ــ وەشاندنەوە: (زەن. ، هەورا.) هوورش برینگان، (موک.) کەمژکردن، کژکردن. باراندن: گولـلە باران، تیرەباران، بەردەباران.

باران

**باراناو:** ناوی بارانەیە کە لە شوێنێکی نزمدا کۆبووبێتەوە.

**بارانە:** باران، بارانە دەخونێ. ــ ی سەر بە قەپووچکە. ــ ی سەر بەکڵاوە. کرێبار، سەرانەی بار.

**بارانەی توند:** بارانی تون، شەس.

**بارانەی وەشت:** ڕەهێڵە، بارانی درشت، شەس.

**بارانەی سەر بەقەپووچکە:** کڵاوسەر، (زەن. ، هەورا.) شەست، کڵاوبەسەر.

**بارانەی سەربەکڵاوە:** (زەن. ، هەورا.) کڵاوبەسەر.

**بارانەی نەرم:** بارانەی وورد.

**بارانەی وورد:** ووردە بارانە، نمبارانە.

**باران بڕان:** مانگی هەرە دوایی بەهارییە کە ٣١ ڕۆژە لە (٢١)ی حوزەیرانێ وە دەست پێدەکات تا بیستی تەمووز لە ڕووی ئەوەوە لەم مانگەدا بە زۆری بارانە چک دەکات کوردان ناویان ناوە ــ.

**بارانپێو:** چتێکە ئەندازەی بارینی بارانە نیشاندەدا.

**باراندن:** باڕاندنی ئاژاڵان، بارەکردن. هێراندن، باڕاندنی مەڕ و بزنانە.

**بارانن:** باراندن.

**باران وەشاندنەوە:** (زەن. ، هەورا.) هوورش برینگان، (موک.) کەمژکردن.

**بارانی:** سەر پۆشێکە لە بەردەکرێ بۆ ئەوەی بارانە تەڕی نەکات.

**بارانی ناوەخت:** بارانی بێ وەخت.

**بارە** (کر.): هات بۆ دەخڵ و دان و ئیتر. بەهرە، سوود. (شەبە. ، ڕۆژ.) بێنە، بهێنە. بابەت، لایەن، لەبارە، لەبابەت، لە ــ ی منەوە چت بیستووە. (زا.) عەرەبانەی دەستی. بونیە، سرشت، فترەت.

**باڕە:** ــ ی ئاژاڵان، بالە، دەنگی مەڕ و بزنانە، کە دەباڕێنن.

**بارەباڕ** (دزە.): بالەبال، باڕەباڕی ئاژاڵانە. ئاشکرا. بە ــ زۆری لێ کرد: بە ئاشکرا زۆری لێ کرد.

**بارەبەر:** بارکێش، پێڕۆ، دەوار، باربەر، وولاخی باری. بەهرەبەر، مووچەبەر، هاوکار. مرۆڤی گوێدێر و گووێ لەمست.

**بارەبەی:** بارکردن.

**بارەبوو:** بڕوانە: باربوو.

**بارەچە** (ئەردە.): مووچەو بەش، بەهرە، داهات، سوود.

**بارەخووێ** (موک.): بارەخووێیانێ، گەمەیەکە، (موک.) باربارانێ.

**بارەخووێیانێ** (هەو.): (موک.) بارەخووێ، گەمەیەکی منداڵانەیە، (موک.) باربارانێ.

**بارەدار:** باری داری، (باک.) بەندی.

**بارەسیاو** (دەر. ، هەورا.): باراش.

**بارەسیاوهاڕ** (دەر. ، هەورا.): باراش هێڕ.

**بارەش** (باک.): زریان، ڕەشەبا، بای ڕۆژهەڵاتییە، گۆیا هەر کاتێکی با لە ڕۆژهەڵاتێوە بێ گێتی تاریک دەبێ بۆیە بە ڕۆژهەڵاتیش دەڵێن بارەش.

**بارەقەڵا:** ئافەرین.

**بارەکە** (ڕەوا.): بارۆکە.

**بارەکەو:** بێچووەکەو، (هەورا.) گوواری، کارەکەو، کێ بار.

**بارەکی:** وولاخی بارییە، بارەبەر.

**بارەگا:** کۆشک و سەرای گەورە، سەرای فەرماندەر، سەراپەردەی میروشایان. خێوەت، خەرگا. قۆناغ. بارگە.

بارەگا

**بارەنج:** ڕەنج بەبا، بێ بەش، بێ بەهرە.

**باربار** (باک.): هاوار و داد و فوغان.

**باربارانێ** (هەو.): جوورە گەمەیێکی منداڵانەیە، (موک.) سووار سووارێن.

**باربارکێ:** سووار سووارێن، گەمەیەکە.

**بارباریتک** (باک.): باڵندەیەکە.

**باربەر:** بارەبەر، وولاخی باربەر. گوێدێر، گووێ لەمست.

**باربەژن** (باک.): تەلەسم، جادوو.

**باربەست:** بارپێچ. ــ کردن: بارپێچ کردن.

**باربەندی:** پێچاندنەوەی باروبنە.*

**باربەنی:** بڕوانە: باربەندی.

**باربر** (باک.): باربر، بارهەڵگر، بارەبەر.

**باربردن:** باربرن، بارهەڵگرتن، بارگوێزتنەوە. دەرەقەت هاتن، لەگەڵ هەڵکردن.

**باربوو:** بەداری، (باک.) مێجبێتی، (زەن.) ترەوانە، (بابا.) باروو بوو، بارەبوو، (کە.) داشن، (هەو.) کێشە، کێشک، پیتاک، (هەورا. ، باد.) بێش، پۆیلە، پۆیلانە. یاریکاری و دەستگرۆیی ئەو کەسانەیە، کە لێیان قەوماوە یا زیانیان پێ گەیشتووە یان لە کاتی ژن هێنان و زەماوەندێدا. ــ یی: کردار و کردەوەی باربوو.

**بارتەقا:** بەرتەقا، هێندە، بەقەد، هەندە، چەندە، بەرانبەر، باتەقا، بارتەقاکردن، بەرانبەرکردن.

**بارچەوت:** هەژار، کارناساز. ــ ی: کارناسازی، هەژاری.

**بارخانە:** خانوو، هەیوان و یا جێگایەکە باری لێ بخرێ. کۆمابارێک، چەند بارێکی لەسەر یەکتری دانراو، شوێنێکە،کە باری زۆر تێدا لەسەر یەکتری دانرابێ.

**بارخانوو:** کەل و پەلی ناوماڵ.

**بارخانی:** نێوماڵ.

**بارخستن:** بارهێنانەخوار. باڵ ڕاکێشانی مریشکە و کەڵەشێرە، کە لەسەر تەنیشتی ڕابکشێ.

**باردا:** چۆمێکە لەلای ڕۆژهەڵاتی ژێری شاری قامیشلوویە.

**باردار:** گیانداری ئاووس.

**باردان** (زا.): بادان.

**بارزان:** پارچە خاکێکە لە کوردستانیدا کەوتۆتە نێوانی ڕواندز و زێبار، لەو خاکەدا خێڵی بارزانی تێدایە، کە ئەویش بەسەر چەند تیرەیێکیدا دادەبەشرێتەوە. ــ ی: دانیشتووانی بارزان.

**بارزە:** جیوەی ڕووەکانە.

**بارسا:** بارست. ــ یی: بارستایی، تیەن.

**بارست:** تیەن، قەبارە، ئەندازە، بارسا، بارسایی. (گەرد.، کۆ.) بڵندایێکەی نێوانی دیراوانە، (هەو.) کەودوو.

**بارستایی:** قەبارەیی، بەقەدەر، بەئەندازەی، بارەسایی، (هەورا.) بارسایی.

**بارسڤک** (باک.): بارسووک. بێ خەم، بێ پەرۆش. (باک.) ــ ی: بارسوکی، بێ بەرپرسیاری.

**بارسووک:** (باک.) بارسڤک، سڤک باری. بێ غەمی، بێ بەرپرسیاری

**بارش:** (باز.) بارفت، باوبۆران، بارشت.

**بارشت:** بارانی وورد، ووردەبارانەی لەسەرەخۆ.

**بارفت** (باز.): باوبۆران، بارش.

**بارقۆل** (خۆ.): خۆڕاگر، پشوو درێژ، بەپشوو.

**بارقورس:** بارگران، گرانبار. ــ ی: بارگرانی.

**بارکەوتە:** کەسێکە باری لێ کەتبێ. هەژار، دەستکورت، کەسێکە بەد بەختێتی و نەهاتی ڕووی تێکردبێ.

**بارکەوتن:** تووشی نەهاتی و نەگبەتی هاتن.

**بارکەوتوو:** بڕوانە: بارکەوتە.

**بارکردن:** ووڵاخ بارکردن، بارکردنی بارەبەر، باربەندی. کۆچ کردن، قۆناخ گۆڕین. خستنەسەر، لێ پترکردن.

**بارکێش:** ووڵاخی باری، بارەبەر، بارگین، بارگیر. گوێدرێژ. کەسێکە ئەرکێکی قورس کەوتبێتە سەری.

**بارکێشان:** خەریک بوون بە هەڵگرتن و هێنان و بردنی باری ئەم و ئەوەوە.

**بارکێشی:** بارکێشان.

**بارگا:** بڕوانە: بارەگا.

**بارگە:** خورجێکی گەورە، کە جێگای نووێن و پێخەفی تێدا بێتەوە، بارگەی بازرگان و ئیتر، کەل و پەلی تایبەتی خۆی وەکوو ڕایێخ و نووێن و جل و بەرگ و خواردەمەنییە، کە بە ووڵاخ هەڵیگری. سەیزخانە، (کە.) سەیس خانە. قورسایی ئەو بارەیە، کە کەسێ هەڵیدەگرێ.

**بارگەچی:** کەسێکە تەنها ئاگای لە بارگە بێ.

**بارگەچێی** (هەورا.): ئافرەتێکە، کە لە ماڵی بووکێوە لەگەڵ بووکێ دەچێتە ماڵی زاوا و لەوێش بە کارەکەری لەلای دەمێنێتەوە. (موک.) سەرسپی.

**بارگەوبنە:** هەندێک ناو ماڵ و کەرەستەیە، کە لە پێش کۆچکردنی ئەواودا دەگوێزرێتەوە شوێنە نوێیەکەی ڕەچاوگیراوە.

**بارگر:** دارێکە بدرێتە بەر بارخانە بۆ ئەوەی نەڕووخێ و نەکەوێ.

**بارگران:** بارقورس، واتا ئەرک و منداڵی زۆرە. خەفەتبار، خەمخوار. ــ ی: بارقورسی، خەفەتباری، خەمخواری.

**بارگیر:** بارگین، بارکێش، ئەسپی ژێربار، ووڵاخی بەرزەی بارەبەر. ــ ی: بارهەڵگرتن، بارکردن، باربەندی.

**بارگیل** (باک.): بارگیر. (باک.) ــ ی: بارگیری.

**بارگین:** بارگیر، بارکێش، (باک.) بەرگیر، کادانە، یابوو.

**بارمتە:** گرێو، شل، گرەو. چتێکە دادەنرێ لەلای یەکێک بۆ دڵنیایی لەبەرانبەر چتێکا، کە لەوی وەرگرتووە بەومەرجە بارمتەکە لە چتەکە بە نرختر بێ.

**بارن:** بەفرێکە با ڕنیبێتی، شوێنێکە با بیگرێتەوە و بەفر و تۆز و خۆڵەکەی بردبێ.

**بارنامە:** بلێت. بەرنامە، ڕێڕاز، قاقەزێکە ئەو چتانەی یەک بە یەک تێدا دەنووسرێ، کە دەنێردرێ بۆ شوێنێکی.

**بارنەبەر:** نەکێش، بارنەوەر، ووڵاخێکە باری نەبات. مرۆی بێ گوێ و لاسار و یاخی.

**بارنەبردن:** یاخی بوون، نەکێشان، سەرکێشی کردن، ئازادی خوواستن، بەزاج، لامۆفەک.

**بارنەوەر:** بڕوانە: بارنەبەر.

**بارنەوەری:** بارنەبەری.

**بارنج** (ڕەوا.): بڕوانە: بارەنج.

**بارڤە** (باک.): بۆران، باو بارانە، ڕەشەبا.

**بارۆشە** (ئەردە.): بارەشێن.

**بارۆکە:** (ڕەوا.) بارەکە، (هەورا.) وارۆکە، چوولەک، (دەر.، ژاوە.) وارک، کەرگ، مریشکێکی بارە تا تەمەنی دەگاتە ساڵێکی.

**بارۆم** (هەورا.): بارام.

**بارو** (باک.): بورج، برج. (زا.) قەڵاو، (ئەردە.) قوللە. بارووت.

**باروبارخانە:** کۆچ و کۆچبار. ــ ی ماڵان.

**بارووبنە:** ماڵ و کۆچ، کۆچ و کۆچبار.

**بارووبوو:** بڕوانە: باربوو.

**بارووت:** دەرمانی تفەنگێ، دەرمانی چەکانە، تۆزی ئاوورهەڵکردنییە. کارگەی ــ یێ: ترتیزک، توورتێزک، تلۆتێزک، بارووتخانە.

**بارووتە** (باک.): سەرسەری، خوێری، تەنبەڵ.

**بارووت پێژ:** بارووتساز.

**بارووت پێچ:** باروتساز. ـــ ی: بارووتسازی.

**باروتخانە:** کارگەو یا کۆگای بارووتی، تلۆتێزک، توورتێزک، ترتێزک.

**بارووتساز:** بارووت پێژ. ـــ ی: بارووت دروستکردن.

**بارووتکەر:** باروتساز. ـــ ی: بارووتسازی.

**بارووتی:** چتێکە لە بارووتی دروستکرێ.

**بارووود** (لو.): بارووت.

**باروسەروزمانی** (هەورا.): بەڵغی سەری زمانی.

**بارووشە:** باوەشێن.

**بارووشەی بایی:** باوەشێنی کارەبایی.

**باروونە:** بادرەنگ، گیایەکی بۆنخۆشە و لکەکانی باریک و گوڵەکانی وەنەوشەیین گەڵایەکانی مشارین وەکوو سەوزەوات دەخورێ لە پزشکیشدا بەکاردەبرێت. مێش هەنگووین زۆرتر لەسەر وی دەنیشن.

**بارهاتن:** هاتنەبەر، پێگەیین، دارەکە یا منداڵەکە بارهاتووە: پێگەیشتوە.

**بارهاووردن:** پەروەردەکردن، رەنێوەهێنان.

**بارهەڵگر:** مرۆڤ، وولاخ یا ئوتۆمۆبیلێکە باری هەڵگرێ.

**بارهەڵگرتن:** بار لەسەر پشتی دانان.

**بارهنگ:** تووم رەکیشە، تورەکیشە.

**بارهنگف** (باک.): تەنبەڵ، بێ مەزە.

**بارهنگێف** (باک.): کەسێکە مەردوومی پەست و تووڕە بکات.

**باری:** وولاخی باری، بارەکی، وولاخێکە بۆ بار دەست بدات.

**بارێ:** کەوایە، ئەمجار، هەرنەبێ: ـــ کە خێرت نییە شەڕیشت نەبێ.

**باریە:** نووێڵ، ئاسنێکی درێژ و ئەستوورە بەردی زلی پێ هەڵدەکەنرێت.

**باریت:** باڵندەیێکی گچکەیە وە مراوی دەچێ.

**بارێزان:** گەڵارێزان.

**بارێزە:** بەری ناپەسند و یا نەگەیشتوو کە با لە دارێی دەکاتەوە، (خۆ.) بادرێزە. (رەوا.) خاڵەرەش، گیایەکە لە ناوێدا دەژی لاسک و ریشەکانی رەشن و سێ پەرەیە. (کۆ.، بابا.) گیایەکی بۆنخۆشە بە بەرسینگیدا دەکەن، خەزەلۆک، خەزەرۆک، (هەو.) خەزەرە، (هەورا.) بەرەزا. ووردەبێکە، کە لەشت ببێتەوە. (ئەردە.) باخۆر، درەختێکە با بەرەکەی وەراندبێ.

**بارێسە:** دووخ. (ئەردە.) فرفرۆکەی منالانە، کە با دەیخولێنێتەوە. دەوار، کۆماچ.

**بارێسەی چادر:** پارچەی چەرم یا داری خڕ کە لەسەر دار ئەستوندە قایم دەکرێ و بەنی لە دەورەی دەپێچن، کە دەبەر چادروخێوەتان دەدرێت.

**بارێسەی دووخ:** سەرەتەشی.

**باری سەربار:** ناوبار، سەربار.

**باریک:** (باد.) زراو، زراڤ، زیراڤ. چیلاز، رفت، فین، لەوەند. لاواز، بێ تین، بێ تووک، چەلم، مسری. ـــ بوون: زراوبوون. لاواز و بێ تین بوون.

**باریکان:** ریسی زۆر باریک، دەزووی زۆر باریک، باریک.

باریکان

**باریکایی:** ئاستی باریکی چت، باری باریکی چت.

**باریکە:** درومانی سەرپەراوێزی کەوایە. ناوی دێیەکیشە لە ناوچەی عەربەت. تیلمە، سیرمە، پارچەی باریک لە چەرم یا پارچە.

**باریکەرا:** باریکەرێگا، رێگای باریک و تەسک، رێگە باریکە.

**باریکەرێ:** باریکەرێگا، رێگای باریک و تەسک.

**باریکەرێگا:** پیادەرێ، رێچ، رچە، رچان، رەچە، رچەرێ، باریکەرا، رچکە، رێچکە، شیڤەرێ.

**باریک وبنێسی:** لە رولاوازبوون بە هۆی نەخۆشی درێژە پێدراوەوە: ئازەر داویەتە باریک و بنێسی.

**باریکی:** زراوی، لەوەندی.

**بارین:** (باک.) ڤارین، (هەورا.) وارین، (دەر.) داکردن، هاتنە خووار و دادانی بارانە و بەفرە، (لو.) هێنان.

**بارین:** باراندنی ئاژاڵانە.

**بارینە:** وەنەوزە.

**باز:** باڵندەیێکی دندووک خواری گۆشتخۆرە بۆ راوی کەوێ بە خێودەکرێ و چاوی جووانە و کونجر کونجرە، (با.) ئاخایۆک، بە نێرەکەی دەڵێن: جوڕە. بازی مێ: (بابا.، رۆژ.) تەوار، باز لە دووهێلکە پتر ناکات لە ساڵێدا، کە هەڵی هێنا تەوار لە پاش گەورە بوونی دەڕوات و ئەویتریش دەمێنێتەوە. وولاخی بەرزەیە، کە نێو چاوان و پەلەکانی سپی بن، بازوو، بازە، بەڵەک، سپی. بە دووای هەمر ووشەیێکەوە بنووسێ دەیکاتە بکەر واتا لە کردار و رەوشتدا: فێڵباز، قوماربساز، ساختەباز. قەڵباز. پەرین، پەڕش، ووزاق، تەوولباز، قەڵەمباز، چەنگ، مرۆ بەسەر جۆگە و یا قووڵکە و شووێنێکی تردا قەڵەمبازیدا و بپەڕێتەوە (باز)ی پێ دەڵێن. ـــ دان: ووزاق کردن، خووەچەنگ کرن، تەوولباز لخووەدان، هلجنقین، ڤەجنقین، فتلۆپاچک، فرتدان، پازدان، بەهین. ـــ پێدان: هلچنقاندن، ڤەجبقاندن. ـــ دان: چەنک کرن. (باک.) جوورە هەڵپەڕینێکە. کورتکراوەی ناوی بازیانە بۆ سەرچاوەکانی ناوەرۆکی ئەم فەرهەنگە. دووبارە، دیسان، نیتر، هەم.

باز

**بازاڕ:** (هەو.) بازێڕ، چەند دووکانێکە، کە شووێنی کڕین و فرۆشتنی تێدابێ، وازاڕ. ـــ ی بەرمێن: بازاڕی بە برەو. ـــ کردن: لە نرخ پرسین، سەوداکردن. ـــ: سەودا: بازاڕی گەرمە. بێ ـــ: ناڕەواج. بێ ـــ ی: ناڕەواجی.

**بازاڕتیژی:** بازاڕگەرمی، بازاڕخۆشی.

**بازاڕکەساس:** بێ بازاڕ. ـــ ی: بێ بازاڕی.

**بازاڕگەرم:** بازاڕ تیژ، کەسێکە سەوداو کڕین و فرۆشتنی زۆر بێ. ـــ ی: زۆر و زەوەندی کڕین و فرۆشتن لە بازاڕیدا.

**بازاڕی:** مرۆی خووێڕی و هیچ و پووچ. کەل و پەلێکە، کە تایبەتی و چاک نەبێ.

**بازانی** (باک.): جوورە بووزوویێکە.

**بازە:** تەرم، بەست، بەستی (جەنازە). بەڵەک، باز، (جا.) بازگ. جوورە چنراوێکە.

**بازبازان** (ئەردە.): بازدبازدێن.

**بازەبەران:** مانگی شوبات، کە ٢٨ رۆژە، کە شەوگار درێژ دەبێتەوە و هەموو شەوێک دووخولەک (دەقیقە) درێژتر دەبێ.

**بازەڵە:** بازەڵێن. (ئەردە.) پڕڕوو، ئازا، بێ شەرم. چتێکە کەمێک بەڵەک بێ. منداڵێکە، کە کزر و گەورە بووبێ. ــ خووێندن: برێتییە لە بێ شەرمی و چاونەترسی: فیسارەکەس چاک بازەڵەی خووێند.

**بازەڵێن:** بازەڵە، (باک.) بەردبەردانێ، گەمەیەکە، قاچان، هەڵمەقۆ.

**بازەند:** مەچەک.

**بازەوان:** کەسێکە هەوەسی لەگەڵ بازڕاگرتنێ و بە خێوکردنی بێ.

**بازبازانێ:** بازدان، جوورە گەمەیێکی منداڵانەیە .

**بازدبازدێن:** یەک بە دووای یەکتریدا بازدان.

**بازبازک** (باک.): بازتە.

**بازبازکێ** (ڕۆژ.): سێ بڕکەیە لە سێ بازێدا. بەڵەک، ڕەنگێکە پەڵەپەڵە بێت.

**بازبازۆکێ:** بازبازێن.

**بازبازێن:** بازدبازدێن.

**بازبەند:** نشتوو، جاران جادووگەران بۆ هەموو جوورە نەخۆشی و کارەساتێکی بۆ گێل و نەزانانیان دەنووسی و لە باسکیان دەکرد. بازی بەند.

**بازبازدێن:** بازبازۆکێ.

**بازبردن:** بازدان، قەڵەمبازدان.

**بازخوویز:** بەرپرسیاری.

**بازد:** بازدان.

**بازدیی** (باک.): هەڵاتوو.

**بازدبازۆکێ:** هەڵاتن.

**بازدان:** خۆهەڵدان لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر، چەنک کرن، قەڵەمبازدان. لەشەڕی ــ: هەڵاتن. لە دەرفەت ــ: دەرفەت لە دەست دان. (باک.) مردنی مەڕ و بزن.

**بازدەبەران:** نێوەڕاستی بەهارە کە شەوی دوو دەقیقە درێژ دەبێ.

**بازدەڵباز:** بازبازێن.

**بازدبردن:** بازدان.

**بازدپەڕین:** بازدان.

**بازپەڕێن:** بازهەڵفڕێن.

**بازدپەڕین:** قەڵەمبازدان .

**بازددان:** بازدان.

**بازدی:** چوونەوە دیدەنی.

**بازڕ** (ئەردە.): باڵندەیێکی گۆشت خۆرە بەقەد ڕیشۆڵەیێکی دەبێ ڕەنگی بۆرە قنەیە.

**بازڕە:** (ئەردە.) گەڕانەوەی گوللەیە لە پاش ئەوەی، کە لە نیشانەی بدات. (ئەردە.) کەوانە: کەوتنی تیر و بەرزبوونەوەی. (بابا.) فیچقە، خووێنی بازڕەقەی بەست: خووێنی فیچقەی بەست. بەرەو خووارەوە بە پەرێشانی و ئاڵۆزی غاردان ،(کە.) تەکاندانە خۆ بۆ بازدان.

**بازرەقە:** لە پڕەدر چوونی گیاندار بە چالاکی: مارەکە بازرەقەی بەست. فیچقەکردنی خوێن لە لەش و یا چتی شل لە دەفرێکیدا کە کونی تێ بێ.

**بازک** (باک.): باڵ هی پەڕندان.

**بازرگان:** بنەکدار، ئەوکەسەیە هەبوو بێت بازرگانیی پێ بکرێت، کووتاڵفرۆش، سەوداگەر. ــ ی: (باک.) دان و ستاندن، سەوداگەری، پیشە و کاری بازرگانە، کڕین و فرۆشتنی کووتاڵ.

**بازگ:**(جا.، هەورا.، هەمە.)، بازوو، بازە، بەڵەک، ڕەش و سپی، پلپلی، پلپلین.

**بازگە:**(ڕەوا.) بۆسەی ڕاوکەرانە. تەپۆڵکەی سەرەوەی گرد و چیایانە، (هەورا.) تەپۆڵکە، (ڕەوا.) بەراژ، ملەقوتکە. لە سەر جۆگە و کەند و چاڵ و ئیتر، شووێنێکە بتوانرێ بەسەریدا باز بدرێ، پردەباز، بووار، بۆربۆرک، (باک.) بەزدۆک.

**بازگەشت:** پەشیمان، ژیوان، گەڕانەوە. ــ ی: پەشیمانی، ژیوانی، گەڕانەوە.

**بازگ بەڵەک:** بڕوانە: بازگ.

**بازگووڕ** (باک.): ئەسپاردن. ــ ی خووەدێ بوون: بە خووا ئەسپاردن. هیوا، ئومێد، یامەرتی.

**بازگوڕی:** یارمەتی.

**بازمان** (ئەردە.): منداڵێکە لە دووای مردنی باوکی بەجێ مابێ، باووک مردوو. دامان، خەفەتباربوون.

**بازمانە:** بڕوانە: بازمەنە، پاشماوە.

**بازمەنە:** پاشماوە، ماوەوە، بازمانە.

**بازن** (باک.، هەورا.): بازنە.

بازن

**بازنە:** بازن، بازبازک، بازبەند، لە زێڕ و زیو و کانانی تر دروست دەکرێت، (هەورا.) دەسبەن. تەووق، چەمەرەی دانەلغاو.

**بازنەگاس**(خۆ.): ئاڵقەیێکی ئاسنە لە کووپەی گاسنی درزدار دەخرێت تا لێک نەبێتەوە.

**بازندە** (ڕەوا.): جێگای بازنەیە لە باسکدا. مەچەکی دەستی، (هەورا.) بازواندە، دەربازۆک.

**بازنک** (باد.): بازنە.

**بازنگە:** بڕوانە: بازندە.

**بازنۆکە:** بەربازن، بازنەی چکۆڵە.

**بازواندە** (هەو.): بڕوانە: بازندە.

**بازۆ** (باک.): سترانێکی کوردییە.

**بازوەن** (فە.): قۆڵ.

**بازۆر** (باک.): ڕەشە با، بای سەخت. ــ ی: باشوو، واشە، باڵندەیێکی دندووک قولاپی بۆرەڵۆک و چەنگاڵ تیژە، پەلەووری بچووک ڕاو دەکات.

**بازۆڵە** (کە.): باسک.

**بازوواندە:** بڕوانە: بازوەن.

**بازوڕ** (ئەردە.): باشوو، واشە.

**بازۆڕ** (ئەردە.): واشە. ــ ی: واشە.

**بازۆڵە:** قۆڵ و باسکی قەڵەو.

**بازوو** (بابا.): ئەبڵەق، باز، بازگ، مانگا یا وولاخی بەرزە و ئاژاڵی ڕەش وسپی. قۆڵ، باهوو.

**بازووبەن:** چتێکە لە زێڕ یا لە زیو یا چەرم دروست دەکرێ و لە قۆڵ دەخرێ.

**بازووبەند** (باک.): (باک.) بازبەند، بازی بەند، باهووبەند، قۆڵەوانە.

**بازووپاز:** زەمزەمەی بێ دەنگ و خامۆشی ئاوورپەرستانە لە کاتی پەرستنێدا.

**بازووی دەرگا:** لاشیپان.

**بازە** (باک.): باز (باڵندە).

**بازێ** (باک.): وەکوو بازۆ وایە. سترانێکی کوردییە.

**بازی:** (ڕەوا.، هەورا.) وولاخی بەرزەی لاق سپییە، (باک.) باز، (موک.) پەل سپی، بەڵەک. (بابا.، هەورا.) وەردێنەی نانی، یاری، گەمە، گاڵتە، گەپ، کایە.

**بازی بەن:** بڕوانە: بازی بەند.

**بازی بەند:** باسک بەند، بازبەند، قۆڵبەند، تۆڵبەند، تۆڵبەندی، باز، ئەو جوورە بازنەیەکە لە باسک دەکرێ.

**بازیچە:** بووکۆکە، چتێکە کە منداڵان گەمەی پێ بکەن.

**بازین:** دۆڕاندن، زیانکردن، لە دەست چوون.

**بازیوان** (بابا.): گیایەکی بەهارییە گوڵی ڕەنگ پیوازی دێنێ.

**بازی هەوایی:** بەرزە حەوایلە، بەرزەهەوایلە.

**بازار** (باک.، مزو.): شار، باژێڕ.

**بازاڕگێڕ** (باک.): سەرۆکی شاری، شارەوان. (باک.) ـــ ی: شارەوانی.

**بازاڕی:** شارستانی، شاری.

**بازەڵە:** لیروکولک و کووانێکی پیسە لە منداڵانی ساوا دێت، کە حەوت و چلەداربێ و دەرنەبێ دەیکوژێ، گۆیا منداڵی ساوا سەرمای لێبدا و یا ژەکی زۆر بخووا دەری دەکات، دەڵێن ئەگەر پێستی مریشکی ڕەشی لێ نرێت دەیڕەوێنێتەوە، گۆیا ئەگەر لە ناو زگی بێت دەیکوژێ. مووررووی بازەڵە دەرمانێکە لە شیری دایکیدا بیسوونەوە و بیدەنێ ئەوەی ناوزگی دەردەکاتە دەرەوە، (کۆ.، خۆ.) گرتەک، زەرتک، باژێڵە، (هەورا.) هەڵێژ (گیایەکە).

**بازەن** (باک.): باوەشێن.

**بازۆ:** بناژۆ، لێخوڕە، (دەر.) بڕان، دەنگی بدە.

**باژێڕ** (هەورا.)، بازاڕ. ـــ کرن: بازاڕ و سەوداکردن، (باک.) شار.

**باژێڕگێڕ:** شارەوان. ـــ ی: شارەوانی.

**باژێڵە** (ئەردە.): بازەڵە.

**باژێڵە:** نەخۆشییێکە لەبەر مووسڵدانی نێرینەی ساوا دەدات و میزی دەگیرێ. (ئەردە.) بازەڵە.

**باس:** بەسەرهات، دەنگ و باس، خوواس. (هەورا.) ئاگا.

**باسارک** (باد.): ئیرکولەر.

**باسەر** (باک.، موک.): بایەکە لە بەهارێدا دێت. بەفیز، بەهەوا، هەوایی، کاو، لووت بڵند.

**باسەرە:** شووێنێکە با زۆر بیگرێتەوە، ئاوی ڕووبار و دەربەندێکیشە لە ناوچەی بازیاندا.

**باسەری** (باک.): بەفیزی، بەهەوایی.

**باستان:** پێشوو، پێشوونیان، کۆنە، مێژوو، باب و باپیرەکانی پێشوو. ـــ ی: پێشوویی، مێژوویی، دێرینە.

**باستیک** (باک.): جوورە شیرینیەکە لە دۆشاوی دروست دەکرێ.

**باستورمە:** باسوورمە.

**باستووق:** بڕوانە: باسووق.

**باسزان:** مێژووزان.

**باسقەننە:** دەسقەننە، باسکی قەننەی، کە زۆرترینی لە دارە ئاڵوویاڵوو دروست دەکرێ.

**باسقەندە:** بڕوانە: باسقەنە.

**باسقەنگە:** بڕوانە: باسقەننە.

**باسک:** (باک.) پەیک، (هەورا.) باهوو، بازۆڵە، چەمپل، چەنگ، نێوانی جومگەی دەستی و ئانیشکێیە. بستوو، بستی، ملە، کەل، تەپۆڵکە، ملەشاخێکی باریک و یا ئەستوور و کورتە، (هەک.) دەستە، بەرە، کۆمەڵە.

**باسکەباسک:** بڕوانە: باسکەسەگ.

**باسکەدار:** تێلا، دیرەک، دیرەگ.

**باسکەسەگ:** جوورە سەگێکی باریکە وە تاجی دەچێ بەڵان لەو گەورەترە، باوکی گۆڵە سەگە و دایکیشی تاجییە، (هەورا.) دووڕە سەگ، دووڕەگ.

**باسکەمەلە:** جوورە مەلەیەکە بە جووڵاندنی باسکان ئەنجام دەدرێ.

**باسکەوجاڕ:** باسک هەوجاڕ، دەسکی هەوجاڕی.

**باسک باسکانی** (هەک.): دەستەبەندی، دەستەبەرێتی.

**باسک بەند:** بازی بەند، تۆڵبەند، تۆڵبەندی باڵ، قۆڵ بەند. بازنە، حەمایەل و یا چتێکی وایە، کە لە قۆڵ بکرێ.

**باسکراو:** گۆرین، باس لێکراو، لێدوواو، ناوبراو، نێوبراو، (باک.) پێژنا.

**باسکردن:** لێدووان.

**باسکلاوە:** کلاورینە، ڕەبەل، (هەورا.) قەلاتینگ، جوورە ڕێواسێکی قولەبنە و ئەستوور و گەلاپانە.

**باسکوول** (باک.): گەمەیەکە بە باسکێتی ئەنجام دەدرێ.

**باسک هەوجاڕ:** بڕوانە: باسکەوجاڕ.

**باسکی جغارە:** مۆدنە، دارجغارە.

**باسکێش:** دارێکی درێژە سەرێکی بەنیلەوەیە سەرەکەی تری لە هەوجاڕ (هێش) قایم کراوە، مژانە، مژانکە، مشان، باسکێش جووتی، (باک.) باسکێ هەڤرکانی یێ.

**باسمە:** جۆشی چاو، تەڕاخوومە، گرێ و دوگمەیەکە لەکاتی چاوئێشەدا لە پێڵووی سەرەوەی چاو پەیدا دەبێ. (هەو.) بۆ خۆیی. چەشنە پارچە قوماشێکیشە.

**باسمبار:** هەفتەییێکی پڕ بارانەیە لە مانگی ئازارێدا.

**باسمبیل** (باک.): بەفیز، خۆپەرست. داواکار. (باک.) ـــ ی: بەفیزی، خۆپەرستی. داواکاری.

**باسنامە:** نامیلکەیەکە، کە چەند سەر بردەییێکی تێدا بێ.

**باسوخ:** (کە.) باسووق، باستیک، باستق، سجووق جووره شیرینیەکە،کە لەدۆشاو و نیشاستە و بادام دروست دەکرێ.

**باسووخواس:** دەنگ و باس، دەنگ، تەرزەنوو.

**باسوور** (باک.): لۆپکە. کرمێکە زیان بەدەغڵ و دانان دەگەیەنێ.

**باسوورمە:** گۆشتی قیمە کراوی تێرخوێیە لەگەڵ بەهاراتا لەناو ریخۆڵەدا هەڵدەگیرێ.

**باسووق:** باستووق. جووره خواردەمەنییێکە لەنیشاستەو شیلەی ترێ دروست دەکرێ و دەکرێتە سەلک سەلک.

**باسی:** (باک.) لاسایی، لاس.

**باسی کرن** (باک.): لاسایی کردنەوە.

**باش:** چاک، چا، چێ، زیخ، خاس، قەنج، نەهیتە. ــ بوون: چاک و خاس بوون. ــ کردن: چاک و قەنج کردن. ساخ، خۆش، لەش ساخ. رۆژباش، شەوباش و نیتر: واتا ئەوکاتانەت بە خۆشی و ساخی بەسەردا رابری. لە باشقالآن کورتکراوەتەوە بۆ سەرچاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە.

**باشار:** چارە، دەرەقەت، توانایی، ژیان. ــ کردن: چارەکردن، دەرەقەت هاتن. ــ ناکرێ: چارەناکرێ.

**باشەڤار** (باک.): ئێوارەباش.

**باشەڵ:** بڕوانە: باشێڵ.

**باشەواڵە:** باڵندەییێکی تیژباڵ و چوست و چالاکە. (شار.) باوەشناوەڵە، کەسێکە سینی یا چتێکی تری بەدەستەوە بێ و بڕوا بەدەست ئاوەڵەیی.

**باشتر:** چاکتر، خاستر، قەنجتر، نەشپا.

**باشترین:** چاکترین، چاترین، قەنجترین.

باشقەیان

**باشرۆژ** (باک.): رۆژباش.

**باشقەیان:** جووره مارێکی ئەستووری درێژ و زەردە و سەرکلکیشی خڕە.

**باشمە:** شەقڵ و نیشانەی خەرمانانە.

**باشۆک** (باک.): باشوو.

**باشوو:** باشووکە، (دەر.) وات. باڵندەییێکە ڕاوی چۆلەکان دەکاو دەیانخوات.

**باش و بووش:** خۆش ڕابواردن.

**باش و بۆشی:** دەست بڵاوی، ماڵبەخۆڕایی دان.

**باشوور:** ژێروو، نیوەڕۆ، نیوڕۆ، وەشت.

**باشۆک:** سەقر.

باشووکە

**باشووکە:** باشوو، باڵندەییێکی دندووک کەوانەییە لە باشوو چکۆلەترە ڕاوی چۆلەکەی دەکات.

**باشۆڵ:** پاشۆڵ، پاشێڵ. کۆش بەرهەڵبێنەیە.

**باشی:** چاکی، خاسی، قەنجی.

**باشیق:** باشوو، سەقر.

**باشیقا:** گوندێکی کوردەکانی یەزیدییە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی مووسڵ.

**باشێڵ:** چارۆکەییێکە ژنان لەکۆڵیان دەکەن دوو سەرەکەی خوارەوەشی بە پشتیانەوە دەبەستن بۆ ئەوەی چتی تێکەن، پاشۆڵ.

**باشیل** (هەورا.): باخەڵ، باغەڵ. باشۆڵ، پاشۆڵ چارەکە.

**باشیلا:** مرۆی ئاوارە.

**باشی و بۆشی:** باش و بۆشی.

**باعاندن:** باراندن.

**باعە:** بارەی ئاژاڵانە.

**باعەبلەع:** بارەباری ئاژاڵانە.

**باغ:** (هەورا.) باخ. تەیار. (باک.) درەخشان، زیندوو. ــ کرن: هاندان. ــ بوون: تونذ و تووڕە بوون.

**باغات:** باغان، باخان.

**باغار** (باک.): بە چوارناڵە غاردان.

**باغان:** باغات. بۆگەلی باغە.

**باغە** (مەک.): باخە، چتێکە لە بنێشت دروستدەکرێ (کاوچووک). (باک.) دەنگی توند و سەخت. جووره برینێکی پیسە لە چوارپەلی وولاخی بەرزە دێت سمی درێژ دەکات و لە کەڵکی سوواری و باری دەخات.

**باغەڵ:** (گۆ.) باخەڵ، پزی، (هەورا.) باشیل.

**باغەوان:** باخەوان، (باک.) باغڤان. ــ ی: باخەوانی، (باک.) باخڤانی.

**باغچە:** باخچە، (باک.) بەخچە.

**باغچەوان:** بڕوانە: باغەوان. ــ ی: باخەوانی.

**باغچەی ساوایان:** خوێندنگەیەکە بۆ منداڵانی تەمەن ٤ ــ ٦ ساڵی.

**باف** (جە.، ڕۆژ.): کشت و گرژکردنی بەن، یا دەزوو لە زۆربادااندا. تەونگەر، جۆلا، ڕێسندە.

**بافەدەنگ** (جە.، ڕۆژ.): خۆپەسند، بێ هۆش، لە خۆبایی. ــ ی: خۆپەسندی، لە خۆبایی بوون.

**بافت** (هەورا.): باو، کات، هەرەت. شایان، ڕەوا، شایستە. ماف. ــ کردن: خەرج کردن، چوواندن. چنین.

**بافتە:** ئەوار، هۆنراوە، جوورە قەیتان و یا شریتێکی پانە لە ئاوریشم و ئیتر دروست دەکرێ لە لێواری کەوا و سیخمە دەدروێت.

**بافرە:** کەتیرەی سپی.

**باڤلە:** بافەلە، باب فەلە، نووێ پسوولمانی کۆنەفەلەیە.

**بافوو** (ئەردە.): تریاک.

**بافوور:** رافوور، سەبیلەی تریاکی.

**بافیاگ:** چتی چنراو. قسەی هەڵبەستراو.

**بافیاک:** بڕوانە: بافیاگ.

**بافیش:** (بابا.) فیشاڵ، (دەر.) فیشار، تڕوتۆپ. ــ کەر: خۆهەڵکێش، بەچاوڕراو، چاوڕاوکەر، (هەورا.) پارچەچی. ــ کردن: خۆهەڵکێشان، بەخۆخوڕین.

**بافین:** تەنین، هۆنینەوە، چنین، هۆنین.

**باڤ** (باک.): باب، باو، باووک. باو، دەستوور، شێوە.

**باڤبرا** (باک.): باب برا، برای باوکی.

**باڤک** (باک.): تیرە.

**باقی** (باد.): بادام.

**باقیتی** (باک.): بابێتی.

**باقینی** (باک.): بابێتی.

**باق** (باد.): لاق، پێ، بەلەک. (باک.) باقە، تەلابی، قەفت، گورزە. باقادەست: مەچەکی دەستی. باقاپێ: جومگەی پێ. (باد.) پەوز. (باک.) نێرتکی سیرو پیازییە.

**باقانن**: بڕوانە: باقاندن.

**باقاندن**: باقەباق کردن، باڕاندن.

**باقە**: بەسە، (ئەردە.) بەستە، (باک.) باق، (دەر.) مەڵو، سەوارە، سوواڵە، گورزە، باوەشێک گیاوگژڵە، کە دروا‌وو بەسترابێ. دەنگی بزن و ڕێوی.

**باقە**: باڵە، بارەی بزنان.

**باقەباق**: باڵەباڵی بزنییە یا هی ڕێوییان، باعەباع، قاڵەقاڵ.

**باقەبەس**: هەر چتێکی باقەی پێ ببەسترێ ـــ ی پێ دەڵێن، بەستەبەند.

**باقەبەست**: باقەبەس.

**باقەبێنە** (موک.): گیایەکە لەدەم ئاواندا بە کۆمەڵ شین دەبێ و گەزێک بڵند دەبێ و گوڵی بۆرە و باقەی پێ دەبەسترێ، بە هەموو گیایەکی تری واش دەڵێن، کە باقەی پێ ببەسترێ، فیزۆک.

**باقباق**: هاواروداد، گازندە.

**باقر**: ژەنگی قاپ و مسێکییە کە ڕووکێشی نەمێنێ کە ماست و چێشت و هەر شلەمەنییێکی تێی کرێ ـــ ی دەکات واتا ژەنگی تێدەدا. مرۆی نەخوێندەوار کە بدوێ ـــ ی دەردەکەوێ.

**باقسمات** (باک.): پسکوویت، شەکەرلەمە.

**باقل** (باک.): پاقلە. کلێنچکی دووگی مەڕی.

**باقلە**: پاقلە.

**باقلەکولیاگ**: باقلەی کوڵاو.

**باقلەکێوی**: (باک.) بۆقلی.

**باقلک** (باد.): باقلە.

**باقۆ**: (دەر.) ماسی گەورە، مانگاماسی. کاریلە یا بەرخێکە لە زگی دایکیدا یا دوای بوونی تووشی دەردێکی بێ چارو بێ دەرمان بووبێ. هەوەڵ بەری هەنجیرییە، کە لە سەرەتای هاوینێدا دەیوەرێنی ئەو جار بەری تەواو دەگرێ، (خۆ.) ئەو چەند دەنکە هەنجیرانەیە کە دووای وەراندنی هەوەڵ بەر بەدارەکەوە دەمێننەوە.

**باقۆتە** (سوو.): نێرتکەپێواز، (هەو.) تەرەلەیلان.

**باقۆیی**: دەردێکی بێ دەرمانی کاریلە و بەرخانە.

**باقوور** (باک.): گەل، ڕان، مێگەل.

**باقی**: بڕوانە: باقیە.

**باقیە**: باقێ، جوورە درووما‌نێکە.

**باک**: لە (باکوور) قوڵە کراوەتەوە بۆ سەرچاوەکانی ناوئەم فەرهەنگە، سام، ترس، ساف، پەروا، دەربەستی، کێمخوا، هەراس، بەباک: دەربەست، باکدار: دەربەست، بێ باک: بێ پەروا، شتیار، گوهقرە.

**باکەش**: بابووێر، باکێش. کەڵەشاخ، ئیستیکان وکوویە لێدان بۆ ئەوەی تاهەلامسێ و نەشتەری لێ بدەن. نەشتەر، هەواکێش.

**باکەش گرتن**: کەڵەشاخ گرتن لە شوێنێکی لەش بە بێ ئەوەی، کە بەنووکی نەشتەرێ بریندارکرێ.

**باکەف**: خشتێکە باش سوور نەبووبێتەوە و کە بخرێتە ناو ئاو هەڵوەرێ.

**باکران**: هەلامسان، پەغان، (باک.) پڕبوون.

**باکردن**: هەلامسان، (باک.) پاچقین، پووم، (باک.) قڕتین، ئاووسان، پەغین، پەیدابوونی با لە زگدا. تووڕە و قەڵس بوون. فیزکردن، بەهەوابوون.

**باکۆفە** (باک.): میوەی شین و نەگەیشتوو.

**باکوور**: سەروو، ژووروو، لای چەپ، بەبای شەماڵیش دەڵێن. کوردستانی ـــ: کوردستانی ژووروو.

**باکوزیرک** (باد.): کڕێوە: بایەکە بەدەم باوە ببارێ.

**باکێش**: باگیر، بادگیر، باکەش، واکێش، (خۆ.) گڵۆێنە.

**باگا** (ئەردە.): شوێنی باگر، باگیر، باخون.

**باگار** (باک.): چووارناڵە، غاردانی وولاخی بەرزە بە چووارناڵە.

**باگەر** (باد.، برا.، باک.): کڕێوە. بای بەهێز.

**باگەرێن** (باک.): بانگێڕ، بانگوش.

**باگەف**: خشتێکە تەواو سوور نەکرابێتەوە لە ئاوێدا هەڵوەرێ.

**باگر**: ووریشێن، بامشت، وەردەوا، شوێنێکە بابیگرێتەوە.

**باگردان**: (باک.) گونەڕۆ، بانگوور، بانگۆرە، بانگۆوەر، باگوردن، باگردێن، بانگردێن، (هەورا.) بانتلێن، بانتلیز، شەولەبان.

**باگردانگێڕ** (بابا.): بانگێڕ.

**باگردێن** (بابا.): باگردان.

**باگرۆ**: بای توندوقایم.

**باگرۆکە**: گێژەڵووکە.

**باگژە** (ئەردە.): بایەکە لە ناوەندی شەماڵ و سەبادا.

**باگلۆ**: خلۆر، تل. ـــ بوونەوە: خلۆربوونەوە، تل بوونەوە. ـــ کردنەوە: خلۆرکردنەوە.

**باگۆرە** (باک.): مشار.

**باگوردان** (ڕەوا.، کۆ.): باگردان.

**باگۆک**: چیایەکی بڵندە و سەختە لە باکووری نصیبینییە.

باگۆرە

**باگونە**: جوورە نەخۆشییێکە لە گونی مرۆڤان دەدا و دەی ئاوسێنێ لەبەر فیزوهەوا.

**باگیر**: باگا، شوێنی باگر. باگیری سەری قەلیانی.

**باگێژە**: گێژەڵووکە.

**باڵ**: قوڵە کراوەتەوەی ناوی (باڵەکانە) بۆ سەرچاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە. باڵی باڵندان، شاقەل. (فە.) قۆڵ، نێوانی شان و ئانیشکێ، بە قۆڵی جلکانیش دەڵێن. پاڵ، باڵ، ناو، نێو، دوڕ، هەندوڕ، لەباڵ یەکنان: لەپاڵ یەکنان، لەنێو یەکتری نان. پێوانەیێکە لە سەری پەنجەوە تا کەپۆ، نەهەنگ. دەست، لە سەری قامکانەوە تاشان.

**باڵ** (باک.): لەگەڵ، کن، لا، نک، جەم، لبال. لەلای، لەکن. باڵی باڵندان. سەرنج. بالاخووەدان: سەرنج دان.

**بالاّ**: بەژن، ئەندام، ئادگار، قەد، تەتیل. درێژی چت. سەرەوە، بان، ژوور.

**بالاّبەرز**: کەڵەگەت، بالاّبڵند، شیکە، شاگە.

**بالاّبەرزە**: قامکی ناوەندییە، قامکی سێیەمی دەستە، هەڵمەقووتە.

**بالاّبڵند**: بالاّبەرز.

**بالاّپۆش**: عابا، باڵتۆ، قاپووت.

**بالاّتە** (دەر.): گوڵی دارێکییە بەرەکەی لە نێوگوڵەکەیدا دیاریکەوێ.

**بالاّدەست**: بالاّدەس، دەستدرێژ، دەست ڕۆیشتوو. ـــ ی: بالاّدەسی، دەستدرێژی.

**بالاّڕووان**: ئاوێنەی گەورە کە بالاّی مەردومی تێدا دیار بێ. پەنجەرەیێکە لە نزیک بنمیچەوە بۆ ڕووناکی و باکێشی.

**بالاّر**: کاریتە، تەژە.

**بالاّشەمە** (ئەردە.): باڵیشمە.

**بالاّشمە** (ئەردە.): باڵیشمە، دارێکە، کە لە دوولای تاقەیدا دادەنرێت بۆ ئەوەی دارەکانی سەری تاقەکە سەرەکانیان بخرێنە سەروان.

**بالاّفڕ** (باک.): فڕۆکە، پەڕۆک.

**بالاّفڕوان** (باک.): فڕۆکەوان.

بالاّفڕ

**بالاڤ** (باک.، باد.): جل شوشتن، جل شۆرین، شیو، کۆڵ. چتمەکێکە بۆ شوشتن ئامادە کرابێ. ـ کرن: شیوکردن، جل شوشتن. (باک.) ـ ی: ئافرەتی جل شۆر، ژنی کۆڵکەر. سووێنەی جل شوشتن.

**بالاّکردن**: درێژبوونی قەد و بالاّ، گەشەکردن، بەرزبوونەوە.

**بالاّکوت** (فە.): کورتە بالاّ. کوڵەبنە.

**بالاّکوڵ** (شو.، هەورا.)، کورتەبالاّ. کوڵەبنە.

**بالاّگەردان**: بوونە قوربانی بەژن و بالاّ، خۆگێڕان بەدەورەی یەکێکیدا.

**بالاّن** (ئەردە.): تەڵە، داو.

**بالاّندن**: باڕاندنی ئاژالاّن، قاڕاندن، (زەن.) کووڕاندن، (باک.) باڕین، کالاندن، کالین.

**بالاّنووێن**: ئاوێنەی بالاّڕووان.

**بالاّنی**: جوورە ئێسترێکی بچکۆلانەیە، کە پێی دەڵێن ئێستێرەگاییلکە.

**باڵە**: باڕە، دەنگی مەڕ و بزنانە. ئەسپی گچکە، (هەورا.) ئۆما. (باک.) حۆل، گەوج، گێل، تێ نەگەیشتوو. باڕەی کاریلانە. دەستکێشی چەرمە. لە باڵە.

**باڵەباڵ**: دەنگی بزنانە، باڕەباڕ.

**باڵەبان** (جا.، شو.): ئاوێنە، ئێستری زەلام و قەڵەو و بەکار. (هەورا.) باڵندەیێکە لە بازی گەورەترە ڕاوی پێدەکرێ. خۆشڕۆ، شاتر. (موک.) دەهۆڵ. یەکێکە لە ئامرازەکانی موزیک. شێپوورێکی گەورەیە لەسەر شاندا دادەندرێت. بازی تەوار، بازی مێنگە. ـــ ی: وەکوو ئێستری زل و لەندەهۆر. خۆشڕۆیی، شاتری.

**باڵەتە** (باد.): میوە یا تەڕەکارێکە تاکتاکێکی پێگەیشتبێ. (باک.) ترێیەکە لە پێشدا بگاتێ. نیشانە. سەرەتای گەیینی میوەیە.

**باڵەتەپە**: بڕوانە: باڵەتەپێ.

**باڵەتەپێ**: باڵەفڕێ، باڵەفڕە، باڵ لێکدان، باڵ بە یەکدادانی پەلەوەر.

**باڵەخانە**: (هەو.) کۆشک، (دەر.) بانهەڵبان، تالار، شانشین، شانەشین، سەرخان.

**باڵەخانەی تاووسانی**: کۆشکی هاوینی.

**باڵەشنە** (باک.): سەرینی چکۆڵەیە.

باڵەخانە

**باڵەشۆڕە**: باڵەشۆڕێ، باڵەتەپە.

**باڵەشۆڕێ**: جوورە نەخۆشییێکە کە لە پەلەوەران بدات باڵی شۆڕدەکا و دەیکوژێ، باڵەتەپێ.

**باڵەفڕە**: فڕەفڕکردنی مەل بەباڵی، باڵندەیێکە تازە باڵی گرتبێ.

**باڵەفڕکە**: (هەورا.) باڵەفڕێ.

**باڵەفڕێ** (هەورا.): باڵەفڕکە.

**باڵەکان**: خێڵێکی کوردە لە باشووری کوردستاندا.

**باڵەکرە**: دارێکی درێژە تەختەیەکی لەسەری قایم کراوە خۆڵ و زبڵی پێ کۆ دەکرێتەوە.

**باڵەکی**: بەرازانی، تیرەیەکە لەم سێ گوندانە دادەنیشن: باڵەکیان، سرێشمە، دێڵەزیا، کە کەوتوونەتە ڕۆژاوای باکووری شاری ڕەواندزێوە.

**باڵەکیان**: شارۆچکەیەکە لەنزیک دیانا لە باشووری کوردستاندا.

**باڵەڵە** (هەورا.): شەپیلک.

**باڵەوان**: باڵەبان، شێپوورێکی گەورەیە و لەسەر شان دادەنرێ. چەرخ، شاهێن، سەقەر، سەقر، باڵندەیێکی گۆشت خۆر و ڕاوکەرە.

**باڵەوگرتن**: باڵگرتن، فڕین.

**باڵەیی**: تیرەیەکی کوردە لە عیراقیدا.

**باڵباز**: باڵیۆز، باڵوێز. سەرباز، گزیر، پۆلیس.

**باڵبازخانە**: باڵیۆزخانە.

**باڵبالی** (باد.): مەڕمەڕشا، هومایین، بلووری.

**باڵبەست**: کەسێکە هەردووک باڵی لەپشتەوە بەسترابێ.

**باڵبەست کردن**: بەستنی هەردووک باڵی مەردوم لە پشتەوە.

**باڵبەستن**: باڵبەست کردن.

**باڵتە** (لو.): تەشوی، تەوور.

**باڵتۆ**: پاڵتۆ، قاپووت.

**باڵتووز** (باک.): دش، خوشکی مێردییە.

باڵدار

**باڵتێ سوولە** (موک.): باڵندەیێکە وە تەڕنە ئەبابیلە ناسراوە، چەوزۆکە.

**باڵخەنجەرە**: باڵندەیێکە لە کۆتر گچکەترە لە سەردەمی فڕینێدا باڵەکانی وەک خەنجەریان لێ دێ.

**باڵدار**: پەڕدار، باڵندە، فڕندە، پەڕەوور، (هەورا.) پەراوور، پەلەوەر، پەڕندە، مەلەوەر، گیاندارێکە، کە بەباڵ بفڕێ.

**باڵدسووکە**: سێرەوەفەلە، باڵندەیێکە ئێوارە و سبەینان پتر دەگەڕێ و ناتوانێ بنیشێ.

**باڵدرێژ**: پشوودرێژ، پشوودار، بارقوڵ، بەپشوو، ددان بە جەرگی خۆداگر. ـــ ی: پشوودرێژی، ددان بە جەرگی خۆ داگرتن.

**باڵقنە** (شو.، باک.): سەنیر، سەرین، سەنیرێکە بە قولاپی چنرابێ.

**باڵشمە:** لاشیپان و داری دارەڕای سەردەرگا و پەنجەرەیە.

**باڵ فش کردنەوە:** باڵ فشەوکردن.

**باڵقەدان** (باک.): پاڵدانەوە.

**باڵق:** سەرە، بانگ، قراسە، قرامێر، پیٚ گەیشتوو، پیٚ گەییک، شەیتانی بووگ، شووکام، لیفکام. (باک.) ـــ بوون: پەرفین.

**باڵک:** لە ناوی (باڵەکیان) قوڵەکراوەتەوە بۆ سەرچاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە.

**باڵگاشە** (خۆ.): چاووڕاو، شات و شووت.

**باڵگە** (باک.): سەنیر، سەرین، بالیف. هەر چتێکی وە بەر چتێکی قورس بدریٚ تا ڕای گریٚ باڵگەی پێدەڵێن.

**باڵگرتن:** فرین.

**باڵگرتنەوە:** فرینەوەی باڵندە.

**باڵگک** (باک.): سەنیر، سەرین.

**باڵگۆک** (باک.): سەنیر.

**باڵگەهـ** (باک.): سەنیر، سەرین.

**باڵگیف** (باد.): سەرین، سەنیر.

**باڵنە:** باڵندە، فرۆکە.

**باڵنج** (فە.): سەنیر، سەرین.

**باڵندە:** پەلەوەر، مەر، پەڕدار، (خۆ.) باڵدار، فرندە، پەڕەوور، (زەن.) پەرندە، مەل، مەلەوەر، پەڕاوور.

**باڵندەی خانەکی:** باڵداری کەوی.

**باڵندەی کەوی:** باڵداری کەوی.

**باڵندەی گۆشت خۆر:** باڵندەی گۆشت وەر.

**باڵندەی گۆشت وەر** (هەورا.): باڵندەی گۆشتخۆر.

**باڵنک:** جوورە ترنجێکە.

**باڵنگو** (ئەردە.): بادرەنگ، باڕووتە، تۆوی گیایەکییە.

**باڵنگی** (باک.): سەنیری ژێر پێیانە.

**باڵۆ** (باک.): هەرنەبیٚ، کە هەرنەبیٚ، بەلای کەمەوە.

**باڵۆر** (باک.): خلۆر. ـــ بوونەوە: خلۆر بوونەوە.

**باڵورە:** (خۆ.) بەلۆرە، (جا.) گۆرانییەکە بەسەری قامکان لە گەروو دەدریٚ جا پێکدێت. باڵورەییێکی، کە کوڕان لێی دەدەن: هەیارۆ. دەلینگی هەڵپێچراوی ژنە ڕەوەندانە.

**باڵۆری:** بڕوانە: باڵۆرە.

**باڵۆز:** باڵیۆز.

**باڵۆکە:** (هەورا.) باڵووکە، باڵووکیٚ، (باد.) باڵوویک.

**باڵۆن** (فەرەنسییە.): باڵافڕ، فرۆکە.

**باڵووپاڵ** (باک.): بەراوەڵ، بەروەدە، فراوان. خۆش.

**باڵوور** (باک.): قوونە جوورە (قوونی مریشکیٚ)یە.

**باڵووفک** (باک.): سەرینی چکۆڵە.

**باڵووک:** باڵۆکە، گەفە.

**باڵووک ڕەش:** خاڵ.

**باڵۆکە:** گرێیەکی گچکەیە لە لەشی مرۆڤاندا پەیدا دەبیٚ.

**باڵووکە** (کۆ.): باڵندەییێکی گچکەیە وەکوو کوللە وایە قامکێکی درێژو چووار لاقی هەیە و بە پێیانیش غارەدەدا و دەشفڕیٚ لەشی زەرد و باڵی سوورە، کولۆیانیش دەخووا وەکوو زەرووش خووێنی پیس دەمژیٚ، بۆ لێوی ئەستوور زۆر باشە، سەری سیٚ سووچە و ناو قەدیشی باریکە. جۆلاکەرە، حوشتری خووا.

**باڵووکیٚ** (هەورا.): باڵۆلە.

**باڵۆل** (باک.): لوولە، بۆڕی.

**باڵوولە** (دەر.): بابۆڵە.

**باڵوولە:** پاروو.

**باڵوون:** بڕوانە: باڵۆن.

**باڵوویز:** باڵباز، باڵیۆز.

**باڵوویزخانە:** باڵیۆزخانە.

**باڵوویک** (باد.): باڵۆکە.

**بالی:** کورتکراوەوەی ناوی بالیسانە بۆ سەرچاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە.

**باڵیٚ** (هەورا.): باڵەدارینە.

**باڵیشت** (لو.): سەرین.

**باڵیشمە:** داری سەرینی گورگە و دارەڕاو سەرتاقە.

**بالیف** (هەورا.، کۆ.، بار.): سەنیر، سەرین، (باد.، هەکا.) پالگوه، پالگهە.

**بالیفە** (مرک.): دۆشەگێکە پڕی دەکەن لە کا یا پووش بۆ نێو لانکیٚ، (هەورا.) دۆشکەڵە، (هەو.) باتمان.

**بالیفک** (باک.): سەنیری گچکە.

**بالیفۆکەی ماری:** جوورە کرمێکە.

**باڵین:** سەنیر، سەرین، دیرەکێکە، کە وەبەر دیواری شکست دەدرێت تا نەڕووخیٚ.

**بالین:** سەنیر.

**باڵینە** (هەورا.، دەر.): ملوانەییێکی نەرمە لە چەرم و پەڕۆ و پالاتانی دروست دەکەن لە ملی کەر و ئێستر و گاو ئیتری دەکەن تا نیر برینداری نەکات و ئازاری پیٚ نەگەیێنیٚ، (هەو.) کۆپەلان. چتێکە لە پەڕۆ بەخڕی دروست دەکریٚ وە لەسەر تەنەکەی منداڵ دادەنریٚ و منداڵەکەی لەسەری ڕادەهێڵن، یا کرێکار دەیخاتە سەر سەر و یا شانی و چتی قورسی لەسەر دادەنیٚ.

**باڵیۆز:** باڵویز، باڵباز، سەفیر، شابەندەر، (باک.) بایلۆز. ـــ خانە: باڵویزخانە، شابەندەرخانە.

**بام:** با، دەبا، بۆ پەلە و جەخت دەخرێتە سەر فەرمانی کەسێکی نەدیوو و ئاخوەر و ئاخووەران: بام بڕوا، بام بڕۆین، بام بڕۆم. ڕەشتاڵە، ژاڵە، چەردە

**بامەن:** لە بەهمەن کورتکراوەتەوە.

**بامبوو:** قامیشێکە وە حەیزەرانی دەچیٚ.

**بامبوول** (ئەردە.): فیٚل، کەلەک، ساختە، جادوو.

**بامجان** (ئەردە.): باینجان.

**بامجان فەڕەنگی:** تەماتە، توماتە.

**بامجانەفەڕەنگی:** تەماتە.

**بامشت:** باگر.

**بامیٚ:** بامیە.

**بامیە:** بامیٚ.

**بان:** قوڵـە کراوەوەی ناوی شاری (بانە)یـە بـۆ سـەرچاوەکانی نـاو ئـەم فەرهەنگـە. (بـاک.) سـەربان، بـانی خـانوو، بـەربانک، کـەلک. سـەر سەرەوەی چت. (ئـەردە.) سـەر، ژوور: بان چاوم: سـەر چـاوم. بـەرزی و بڵندایێکی ڕاست و تەختە. (باک.) بانک. بانکرن: بانک کردن.

**بانا** (فە.): دووا ڕۆژ.

**بانـاندن** (دزە.): دووبـارە وەبەرخسـتنەوە، گەڕاندنـەوە سـەر، (ڕەوا.) بانین، (باک.) بانەک کرن، تەماشاکردن، نوڕین، مێزەکردن.

**بانـە:** شـارێکی کوردسـتانە لـە ڕۆژاوای کوردسـتانی ئـێرانێدا سـەر بـە هـەرێمی ئەردەلانییـە. (بـاک.) هاوینگـە، هـەوار، هەوارگـە، لەوەڕگـەی بـەهارێی ئاژاڵانـە. ئـەو خانانەیـە، کـە جووتیـار لـە وەرد دا دەیکێشـیٚ بـۆ ئـەوەی کـە تۆوی پێوەبکاو بزانیٚ چـەندی تۆوی بـە زەوییەکـەدا کـردووە، کاوەخان، ڕۆژە جووتیٚ لە زەویدا. بە ڕزایی نێوانی دوودێراوانە.

**بانەسەرە:** تەپەی سەر. جوورە خشڵێکی ژنانە.

**بانەک** (باک.): ڕەفتار، شووێن، خوو، ڕەووشت. ــ کرن: بەرخ و کاریلـە و گوێلک و ئیتر وەبەر دایکیان خستنەوە.

**بانەگا:** بەر، شەرمگا، جێی ڕووانی مووی خووار بەر مووسڵدانە.

**بانەمەڕ:** بەختـەباران، شەسـتەباران، گولاٚن، مـانگی دووەمـی بەهارێیـە. بنەگە، هەوارگە، وارگە، وار.

**بانەناو** (هەورا.): سوواخ.

**بانەوانک:** جرجەمشک.

بانەوانک

**بانەوبان:** لە بانێکەوە بۆ بانێکی تر بازدان.

**بانبارگە:** بەر بووکێکە سوواری سەربارگەی بووک دەکریٚ و دەنێردریٚ بـۆ ماڵی زاوا.

**بانبانەگا** (ئەردە.): ژێرناووک.

**بانبانک:** (موک.) ڕسک، بانەوانک، ڕستی، جوورە مشکێکی بسـت و نیوێک درێژ و چاو زلـە و سوور بەڵەکە لـە نێومـێرگ و کەڵەکـە بـەرداندا دەژی، دەشڵێن گۆیا هەر لەسەر کۆمای گەنجینەی زێڕ دەنووی.

**بانبراو** (خۆ.): گڵەبان.

**بانبز** (بار.): مامز، ئاسک.

بانبز

**بان پۆشین:** جوورە خشڵێکی ژنانەیە، لاگیرە.

**بانتلیر** (هەورا.): باگردان.

**بانتلێن** (هەورا.): باگردان.

**بان جیلە:** بڕوانە: بانیژە.

**بان چەوک** (دەر.): سەرلانکە.

**بانخانی** (دەر.): سەربان.

**باندان** (جەبا.): شاردنەوە، داپۆشین.

**باندەر:** تۆفانی بەفر، کڕێوە.

**باندەڤ:** سڕی و ساردی سەخت.

**بانسەر:** لەسەر سەر، بەچاوان. دراوێکە لـە تۆقەسـەری کڵاوی ژنان قـایم دەکریٚ بۆ ئەوەی ئالقەی دەسماڵی پێدا کریٚ.

**بانسەرە:** جوورە خشڵێکی ژنانەیە.

**بانشان:** سەرشان.

**بانقۆ:** جوورەقومارێکە.

**بانک:** جووانگە. شووێنێکە پارەی تێدا دەگۆڕنەوە و تەنها سەوداو دان و ئەستاندنی پووڵی تێدا دەکرێت، لەوێدا هەر خەریکی پارە وەرگرتن و بـەم و بەودانن بە سوود. ئەو کەسەیە گوێلک و یان کار و بـەرخی نـەبان وەبـەر دایکی یا یەکێکی تر بخاتەوە، (دزە.) بانۆک.

**بانکەر** (باک.): بانک کار، جارچی.

**بـانکوت:** جـوورە گـەلاٚ کوتکێکـی زل و پـان و درێـژە بـۆ کوتانـەوەی لـە گوورێسـەوانان لەبـەر دڵۆپـە و بارانـە. مرازێکـە لەبـەر دڵۆپـەی بـانی پـیٚ دەکوتنەوە. کەسێکە بانی بگێڕی یا بیکوتیٚ.

**بـانگ:** لای سـەرەوە، سـەرگ، (ئـەردە.) بـانگین، سـەرگین. (بـاک.) هـەڕەتی بـاڵقی، دبانگاخووەدایـە: هـەڕەتی بـاڵقیتی. (هـەو.) پرسـە، سەرەخۆشی، تازیانە. ــ هیشتن: بانگهێشتن کردن. هاوار و داد و ڕۆڕۆ. ــ هەڵدان: هاوار و داد و ڕۆ ڕۆکردن. هەی، هەلا، ئـامرازی گـاز کردنییـە: ئەی، وەی، ئەریٚ، ئەرۆ، گاز، گاڵ، وانگ بۆ نووێژی یا بۆ فەرمانێکی. ــ کردن: گازکردن، (هەورا.) چڕین، (دەر.) چڕینەوە. ــ بکە: بچڕە، گازکە، چڕە. هەلاٚڵـە، هەراڵـە، (ئەردە.) چڕە، دەنگ، قاو، قووڵـە.

بانگە

**بانگـاشە:** چاووڕاو، شات و شووت، پڕۆپاگاندە.

**بانگـە:** بـانگ گـە. جێـی بـانگ. (دزە.) مێتوولکـە، مێتوولە، (دزە.) بانگۆڵە، میتکنە.

**بانگـەبانگ:** بـانگی یـەک لـەدووای یـەکتری، گازەگـاز، هەراوهوریا، نێوی دەنگانە.

**بانگەڕا:** باگردان، (زا.) بانگوش.

**بانگەریتک** (باک.): باگردانی چکۆڵە.

**بانگەشە:** چاووڕاو.

**بانگەواز:** بانگ کار، جارچی، بانگدەر. بەدەنگ بانگ کردن، بانگاواز. ــ ی: بانگدان، جاڕ، هەراڵـە، هەلاٚڵـە.

**بانگـدان:** بانگەوازی، هەراڵەکردن، چڕین، دەنگ کردن. بـە دەنگی بڵنـد کاتی نووێژ بە گووێی نووێژکەران هەڵێنان.

**بانگدەر:** گازکەر، بانگەواز. ئەو کەسەیە بە دەنگی بڵند بـانگی خەڵکی بکات بۆ نووێژ کردنیٚ.

**بـانگرۆز** (ڕەوا.): خلـۆر. ــ بوونـەوە: خلـۆر بوونـەوە. ــ کردنـەوە: خلۆرکردنەوە.

**بانگ کەر:** گازکەر، چەڕەندە، هاوارکەر، بانگەواز، بانگدەر.

**بانگ کردن:** گازکردن، گاڵ کردن.

**بانگردێن:** باگردان، باگردێن.

**بانگلواز** (کە.): (کە.) بانگ واز، جاڕ.

**بانگلۆر:** خلۆر. ــ بوونەوە: خلۆربوونەوە. ــ کردنەوە: خلۆرکردنەوە.

**بانگلۆز** (خۆ.): بڕوانە: بانگلۆر.

**بانگلێر:** باگردان.

**بانگلێن:** باگردان.

**بانگ مەل:** ئاوازەی باڵندە.

**بانگۆر** (باک.): باگردان.

**بانگوڕ** (سور.): خلۆر. ـــ بوونەوە: خلۆربوونەوە. ـــ کردنەوە: خلۆرکردنەوە.

**بانگوور** (باک.): باگردان.

**بانگوش** (ڕەوا.): ئەو کەسەیە باگردانی لەسەر بانی بگێڕێ بە پارە و کە بەفریش باری بیماڵێ، (باک.) بانگێڕ.

**بانگوشی:** بانگێڕی.

**بانگۆڵە** (دزە.): مێتولکە.

**بانگۆوەر** (باک.): باگردان.

**بانگوێر** (موک.): شانەییێکی پان و ددان تیژ و درێژە سندەگڵ و زبڵی پێ بڵاو و پووش و پەلاشی بێستانانی پێ کۆ دەکەنەوە.

**بانگەهەڵدان:** گریان بە دەنگی بەرز، شین و شیوەنکردن.

**بانگهێشتراو:** (باک.) خووەندی.

**بانگهێشتن:** گازکردن، چڕین، بانگێشتن. ـــ کردن: بۆ شایی و زەماوەند و یا بۆ نانخواردن یا بۆ دیدەنی خوازتنی کەسێک، (باک.) ئەخووەندن.

**بانگیاری:** یانە.

**بانگێڕ:** (ڕەوا.) بانگوش، باگردان گێڕ، بانکوت، ئەو کەسەیە باگردانی لەسەر بانی بگێڕێ. باگردان. خلۆر بوونەوەی گاشەبەردانە لە کێوانەوە.

**بانگێڕان** (باک.): گێڕانی بان.

**بانگێشتن:** بانگهێشتن.

**بانگی شێوان:** بانگی سەرەتای شەوێ. کاتی سەرەتای شەوێ.

**بانگین** (باک.): هاوار، بانگ، گاز، چڕین، (ئەردە.) چتێکە لەسەر سەرەوە بێ، لای سەرسەرەوە.

**بانما** (ئەردە.): مرازێکە ئەندازەی با نیشان بدات.

**بانماڵ** (ئەردە.): بەفرماڵ. سەربان. سەرماڵ.

**بانۆکە** (باک.): پارچە زەوییێکی کوتراوە.

**بانۆ** (باک.): بانوو.

**بانۆک:** کەسێکە گوێلک و یا بەرخ و کاریلەی نەبان وەبەر دایکیان و یا یەکێکی تر بخاتەوە. بانک.

**بانوو:** سەری کێو یا ملە و گردی درێژ، بانی، کێو، چیا، (دەر.) بەن، (هەورا.) خات، پای، خانم، خاتوون، بانووی بانووان: خانمی خانمان.

**بانووانە:** خاتوونانە، خانمانە، پایانە.

**بانووچکە:** هەورەبان، بانی زۆر چکۆڵەیە.

**بانەهەڵبان** (دەر.): باڵەخانە.

**بانی** (ڕەوا.): کێو، چیا، بانوو، تەپڵەسەری شاخ یا گردێکە کە تەخت بێ، سەربان، (باک.) بەرز، بڵند، لای ژوورەوە. ـــ کەتن: چوونەسەر، وەسەرکەوتن.

**بان یەک:** تێکڕا، لەسەریەک، کەڵەکە.

**بانیەکنیان:** لەسەریەکتری دانان، کەڵەکە کردن.

**بانیجە:** بڕوانە: بانیژە.

**بانیژە:** ژوورێکی نزمە کە سەربانەکەی وەکوو بەرهەیوان یا حەوش بێ بۆ ژوورێکی بەرز، کە لەسەریەوە بێ، (بابا.) سەربانی بچووک و نزم، بانووچکە، سەربانووچکە، بانجیلە، بانیجە. (شا.) تارمە.

**بانین:** دانرانەوە. بانادن، دووبارە وەبەرخستنەوە، بادانەوەسەر، گەڕاندنەوە.

**باو:** بە سەردا هەبوون، لەو پتر بوون: ئازاد باوی لە زیرەکیدا بەسەر قوتابییەکاندا هەیە. کورتکراوەوەی (ناوی باوەمەر)ە بۆ سەرچاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە. (ڕەوا.) باب، باوک، باف. دێراوی بێستانان. (خۆ.) بەس، تێچن، تێر، تێرا، ـــ بوون: تێراهێنان، تێهەڵاتن. (موک.) ڕۆژ و شەو باشییە لە زاراوەی منداڵاندا. باف، نەریت، شووێن، ڕەوروشت، باقت، داب، یاسا. ـــ ی نەماوە: واتا مۆدەی کۆن بووە. بڕەو، بەرەوە: بەبرەوە. بێ ـــ. بێ برەوە. قازانج، سوود، بەهرە، لا، بای، سەرکەوتن، پیرۆزی، بەخت، باوی منە، باوی تۆیە: لای منە، سوودی تۆیە.

**باوا:** باوکی دایک و باوک، باپیر.

**باوەگەورە:** باوکی باپیر.

**باوام:** بادام.

**باوان:** ماڵی دایک و باب، بابان، خزمان. بێ ـــ: بێ کەس و بێنەوا.

**باوانە** (ڕەوا.): پاساری، نێرەی چۆلەکانە.

**باوانی:** جیاز، ئەو چتەمەکانەیە، کە لەماڵی باوکەوە لەگەڵ بووکێ دەنێردرێ.

**باوە** (خۆ.): دێراو، بۆ، گۆل، (ڕەوا.) بابە.

**باوەنێرک:** ئالقەی مسین یا ئاسنینە.

**باوەپیارە** (بابا.، جا.، هەورا.): زڕباب، زڕباوک، مێردی دایک.

**باوەت:** بابەت.

**باوەحیز:** باوک حیز، حیزباب.

**باوەخووانی** (بابا.): باوەخۆن.

**باوەخولە** (هەو.): گەمەییێکی منداڵانەیە بەدەورەی خۆیاندا دەسووڕێن.

**باوەخولێ:** بابەخولێ.

**باوەخۆن** (موک.): بووک لە ماڵی مێردییەوە بۆ یەکەمین جار، کە بێتەوە ماڵی بابی و بانگهێشتن بکرێ ـــ ی پێدەڵێن، (هەورا.) بابەخوون، (دەر.، دزە.) باوەخوند، (بابا.) باوەخوانی، (ڕەوا.، زرا.) پێ بووایی، (ڕەوا.) پێ بووکێ.

**باوەخوند** (دەر.، دزە.): باوەخۆن.

**باوەخوون:** بڕوانە: باوەخۆن.

**باوەر** (موک.): گەڵاڕێزان، خەزەڵوەر، (هەورا.) بارێزان، نێوی مانگی نێوە ڕاستی پایزێیە. (هەورا.) بێرا، بێرانە، بێنە، بهێنە.

**باوەڕ:** بڕوا، بەقا، بایق. ـــ کردن: بڕوا کردن، دڵ بۆچوون. ـــ پێهێنان: بڕوا پێهێنان، چەسپاندنی چتێک لە دڵدا. بێ ـــ: بێ بڕوا، باوەڕکە: بڕواکە.

**باوەڕە:** بێنە، بهێنە.

**باوەرەک** (باک.): بای سەخت.

**باوەڕپەنەکریا** (هەورا.): باوەڕکار.

**باوەڕپێکراو**: کەسێکە بڕوا و بەقای پێکرا بێ.

**باوەڕپێکردن**: بڕوا و بەقاپێ کردن.

**باوەڕدار**: بڕوامەند. ـــ ی: بڕوامەندی.

**باوەڕکار**: بڕواکار، بەقاکار. ـــ ی: بڕواکاری.

**باوەڕکردەی** (هەورا.): باوەڕکردن.

**باوەڕکری** (باک.): باوەڕمەند.

**باوەڕگران**: گرانباوەڕ. ـــ ی: گران باوەڕی.

**باوەڕگومان** (باک.): دوودڵ، نیگەران لە هەموو چتێکیدا. (باک.) ـــ ی: دوودڵی.

**باوەڕمەند**: بەباوەڕ، باوەڕکری. ـــ ی: بەباوەڕی، باوەڕکرینی.

**باوەڕنامە**: (باک.) باوەڕۆک، بڕوانامە: بەقانامە.

باوەڕنامە

**باوەڕۆ** (هەورا.): بێنە، بهێنە.

**باوەڕۆک** (باک.): باوەڕنامە، بەقانامە، بڕوانامە.

**باوەڕی**: بڕوایی، بەقا، گوور.

**باوەڕێن**: میوە یا گەڵایەکە با وەراندبێتی.

**باوەزیرک** (باک.): چزووی دووپشک و نیتر.

**باوەژن** (بابا.): زڕدایک، ژنی باووک.

**باوەسیر** (باک.): بێوەسیری. (باک.) ـــ ی: بێوەسیری. بای سوور.

**باوەش**: ئامێز، ئاووش، هامێز، (هەورا.) واووشە، باووش، تەلیک، کۆش و بەرسینگ. باوەشێک دار یا پووش، ئامێزێک گیاو چتی تر.

**باوەش باوەشانێ** (هەو.): جوورەگەمەیەکی منداڵانەیە.

**باوەش پێداکردن**: لە باوەش کردن.

**باوەش گرتن**: گرتنە باوەش، لە باوەش کردن.

**باوەشی** (باد.): هەڵۆ.

**باوەشێن**: (باک.) باشین، باژەن، باوەشینک. ـــ کردن: باژەنکرن.

**باوەشین** (باک.): باوەشێن، بارووشە.

**باوەشینک** (باک.): باوەشێن.

**باوەقورەت**: سەرەخرتە، سیم تەنە.

**باوەکوو**: ئەگەرچی، هەرچەندە.

**باوەڵ**: باوڵی.

**باوەڵ بوون**: کۆش و شەل بوونی کار و بەرخانە لەبەر نەخۆشی باوەلێ.

**باوەلێ**: سەید، لە نێو کوردانداـــ بۆ ئەو کەسەی بەکاردەبەن، کە لە بنەچەکدا بچێتە سەر پەیامبەر (محمد) (د.خ). بڕوانە: باویلێ.

**باوەلێ**: دەردێکە تووشی بزنان دێ و پێی دەفیرێنێ: هێندێکیش دەڵێن نەخۆشییێکە لە چووار پەلی کار و بەرخی بدات گۆتی دەکا دەی ئاوسێنی و ناتوانێ بڕوات.

**باوبەران**: باوبۆران، تۆف.

**باوبرا**: باب برا.

**باوبژ**: ـــ ی نێوزک: مەڵەما، بایەکە لە ئاوزگێدا قۆرەقۆڕێ بکا.

**باوبۆران**: باوباران، (هەورا.، زەن.) وەشەن، ڤاوڤاران.

**باوخۆش**: باخۆش، ساخ، گەورە.

**باوخۆشتر**: باخۆشتر، ساختر، گەورەتر.

**باودیان**: بە پێی ئارەزوو و ویست: ئەو خواردنە یا ئەو بەرگە باودیانی ئازادییە: بە ئارەزووی ئەوە. بابەتی ددان، شایانی ددان، واتا بە ددان دەخورێ هێندە نەرمە.

**باوور** (ئەردە.): ئابڕوو، ئاوڕوو.

**باوورە**: بێنە، بهێنە.

**باووسەندن**: بەسەردا زاڵ و چیرە بوون.

**باووش** (هەورا.): باوەش.

**باووشک** (باک.): باوێشک. دارێکە بەرەکەی لە پێش گەیاندنێدا هەڵبووەرێنێ.

**باووشکاندن** (باک.): باوێشک هاتن.

**باووشکین** (باک.): باوێشک هاتن.

**باووک**: باب، باڤ، باو.

**باوکە**: پاساری، چۆلەکەی نێرە.

**باوکەڕۆ**: ووتەیەکە لەکاتی شیوەنێدا بەکاردێنرێ.

**باوکەلێ**: لە کاتی دووانێکی خۆشەویستیدا بەکاردەبرێ، باوکەکەم، باوکە.

**باووکبرا**: باب برا، باوبرا، براباب.

**باووک حیز**: حیزباب، باب حیز، (هەورا.) باوەحیز.

**باووکی**: بابی، باڤی.

**باووگ** (فە.): باب، باووک.

**باوگەرە** (ئەردە.): بابەگەورە.

**باوگرەبازی** (ئەردە.): جنێودان.

**باووڵی**: چامەدانی، باوەڵ، جوورە سندووقێکە، کەل و پەلی تێدەخرێ و دەسکیشی هەیە بۆ هەڵگرتنی.

**باوونەریت** (بابا.، پژ.): شوێن، ڕەووشت، بانەک، ئەگەر بە چاوێکی ـــ تەماشای بکرێت.

**باوی** (ڕەوا.، هەو.): دەردێکە وەکوو باداری وایە تووشی ماڵاتان دێت. بادام، (باک.) بادار، ڕۆماتیزمەدار.

**باوێژە**: باوێ.

**باوێش** (ڕەوا.): گەوە، (هەورا.) قەمچ و پێچ، ڕێگای پێچاوپێچ و خووارایی ڕێگایانە لە بادانەوەدا، ئانیشک و سووچی خووارایی ڕێگایانە.

**باوێشک**: (دەر.) ژاژک، ئارووشک، (باک.) بهنژین، باووشک، هۆنژین، دابچەڕینی زارە لەکاتی خاوبوونەوە و یا خەو بردنەوەدا بەبێ ئەوەی، کە پێی خۆشبێ.

**باوێشکدان**: باوێشک هاتن.

**باویلکە**: بڕوانە: باویلێ.

**باویلێ:** (موک.) باوەلێ، پەپوولە پاییزە، چتێکی خڕی سپی قژداری زۆر سووکە لە پاییزاندا لە گیایان پەیدا دەبێ، لە بەر زۆر سووکی هەمیشە بەدەم باوە لە خولاندایە دەڵێن باوەلێ پایەکی بەسە.

**باوین** (باک.): گڵ کێشانەوە، قووڵکە و نیتر بە گڵ پڕ کردنەوە، بەرهەڵستی جێگایەکی بە خۆڵ پڕ کردنەوە.

**باوی نووێ:** باوی تازە.

**باوینی:** ئی باب، چتێ باب، بابانە.

**باهاتن:** هاتنی با. هاتنەبا، وەباهاتن، بەبابوون.

**باهەنجیر:** هەنجیرێکی بێ تامە،کە لە پێشدا پێدەگات.

**باهر** (هەورا.): بەتاڵ، چۆڵ، خاڵی.

**باهوڕ:** هوڕە، بای هوڕە، ڕەشەبا.

**باهۆر** (باک.): بای سەخت، ڕەشەبا.

**باهۆڕ:** (باد.) نارسم، پەتا، پەسیو، درم، هەلاّمەت، (باک.) هالمەووت. ــ ی: پەسیوی، هەلاّمەتداری.

**باهۆز:** لێمشت، تۆفان.

**باهۆس** (باک.): ڕەشەبا، بای سەخت.

**باهۆش:** هۆشیار، ووریا.

**باهۆڵ** (باک.): بروانە: باهۆس.

**باهوو:** شوورەی کەنار باخچان. شاهێنی تەرازوو، (ژا.) بندەست، ژێردەست، (هەورا.) تەختەی پان. دەست یا باسک. زبر، زوور. داری دارەڕای وەتاغێ. باسکی کێوی.

**باهووا:** داری تاشراوی چوار پاڵوو، دەکرێتە چوارچێوەی دەرک و پەنجەران. شان و قۆڵ. تاسۆ. لاشیپان.

**باهووبەند:** (دەر.، دزە.) بازووبەند، بازی بەند.

**باهوودار:** مرۆڤی چوارشانەی بەخۆوە.

**باهێر:** بایە، بەیار، بوورە، زەوی نەکێڵراو، زەوییەکە چتی تێدا نەڕووێ، چۆڵ. هوڕ، هێڕ، سەراسیمە.

**باهیڤ** (باد.): بادام، بایام، بەداری بادام و بەرەکەشی دەڵێن. چەقالە.

**بای** (هەو.): قازانج، سوود، باو، لا، بای تویە: بەلای تۆدایە و سوودی بۆ تۆ تێدایە، (هەورا.) بیێ. شەمچە، شخارتە.

**بایام:** بادام، باهێڤ.

**بایە** (زەن.): بادی، جام.

**بایەخ** (دزە.، هەورا.): حەل، بەقا، بڕوا، ئەمەگ، دەگەر. جێگا ــ ی نیە: بێ ئەمەگە و پشتی پێ نابەسترێ.

**بایەخدار:** بەقادار، ئەمەگدار، بڕوادار. ــ ی: بەقاداری، ئەمەگداری.

**بایەر:** بیوور، دەم، سپر، نەڤەکری، بەیار، بوورە، باهێر.

**بایەڤ** (جەبا.، کە.): (سۆ.) چەقالە، کالەشێن، نەواشینک، (سۆ.) شەواڵشینک، بەدار و بەرەکەشی دەڵێن: ــ .

**بایەقوش:** کوندەبەبۆ.

**بایەو:** بایەڤ.

**بایەوان:** کەشتی بایی، گەمییەکە بە بای دەڕوات.

بایەقوش

بایجان

**بایجان:** بایینجان.

**بای داروووس:** (هەورا.) داراووس.

**بایدە:** بادیە، کاسە.

**بای دەبوور:** بای خۆرنشین.

**بای ڕۆژاوایە:** (باک.) بایێ بێرین.

**بایز:** ناوی نێرینانە.

**بای زەمەن:** بای سەخت.

**بای سەبا:** بای سەوا، بای ڕۆژهەلاّتێ.

**بای سەخت:** (باک.) بایێ گوڕ، باوەرەک، بای زەمەن.

**بای سەوا:** بڕوانە: بای سەبا.

**بایسوور:** جوورە نەخۆشییێکە.

**بای شەماڵ:** (باک.) بایێ کوور، بایەکە لە باشوورەوە بەرەو باکوور دەڕوات.

**بایق** (ئەردە.): باوەڕ، بڕوا، بەقا، پایەداری.

**بایلە:** جوورە تەنراوێکی زۆر ناسک و تەنکە، کە زۆر جاران با دەیدڕێنێ.

**بایلکە:** باویلکە.

**بایلۆز** (باک.): دەوڵەمەند، باڵیۆز.

**بای نەرم:** (زەن.) سۆزە.

**بای وادە** (موک.): بایەکە لە کۆتایی زستانیدا دێت بەفری دەتاوێنێتەوە.

**بایی:** نرخ، مز، بەها، ئەرجس، چەندبایی، ئەو شووتییە بایی چەندییە: واتا نرخی چەندە، (بابا.) بەهەوا، فیزدار، خۆپەسند، لە خۆ ــ بوون: خۆلێ گۆڕان، بەهەوابوون، (باک.) باداری.

**باییدە:** لەگەن.

**باییر:** بایەر، چۆڵ.

**باییس:** پێویستە، گەرەکە، هەردەبێ بێ، بایست، هۆ.

**بایێ کوور** (باک.): بای شەماڵ.

**باینجان:** بادنجان، (باک.) باجان، گیایەکە بەری وەکوو کوولەکەی دێنێ بەلاّ ڕەشەوقاوەیی دەکرێتە دۆڵمە و چەند جوورە چێشتێکی تر، بە پێشاوی لە چووی سووزە نەکداران بنرێ زۆر باشە.

**باینجان سووورێ** (هەورا.): تەماتە.

**باینجانی سوور:** تەماتە.

**باینجانەسیاوە:** بایینجانی ڕەش.

**بایی هەوا:** خۆپەسند. ــ یی: خۆپەسندی.

**بە:** ناو دەکات بە ئاوەڵناو و ڕۆڵی (خاوەند، مەند، دار، یار) دەگێڕێت: ــ هونەر: هونەرمەند. ــ هێز: هێزدار، بەهۆش: هۆشیار، بەئاگا: ئاگادار. بۆ سووێندە. ــ خودا، بەپێغەمبەر: واتا سووێندەکە بەناوی خودا و پێغەمبەر. هۆ، مایە، بۆنە: پەرتووکەکەم بە دارا دا بۆ ناردی: پەرتووکەکەم بە هۆی داراوە بۆ ناردی. وە، دە، قاقەزەکە بەهەوادا ڕۆیشت: قاقەزەکە وە هەوا ڕۆیشت، بە ڕێیەدا ڕۆیشت: دەڕێیەدا ڕۆیشت. وەک، وەکوو، وە بۆ وێچوواندن. کەسم نەدیتووە ــ شێوەی تۆ: واتا وەک شێوەی تۆ. بۆ هاوڕێ یی، لەگەڵ، وێکڕا، بەسەربەرزییەوە ڕوولە کوردستان دەکەم: بە هاوڕێیی سەربەرزێتییەوە ڕوو لە کوردستان

دەکەم. بۆ بەرزێتی. ـــ داردا کرا. بۆ ئاوەڵکاری کات، بە ڕۆژ کار و کردارو و بەشەویش سانەوە و پشوودان جێگای خۆیەتی و زۆر بەجێیە. یاریکاری و یارمەتی؛ ـــ پێنووس دەنووسم و ـــ چاو دەبینم: بە یاریکاری پێنووس دەتووانم بنووسم و بە یارمەتی چاو دەتووانم ببینم. بۆ چەندێتی و ئەندازەی چت: گەنم لە هەندێ شوێن بە کێشان وە لە هەندێ شوێنی تر (بە) پێوانە. بۆ پێکەوە نووسانی دووچت، لە باغیدا بە ئازادی کوڕم گەیشتم. بۆ لێکدانی دوو ووتە: ڕوو بەڕوو، موو بە موو. بار، شێوە، کاری خۆی (بە) سووکی ئەنجام دا واتا بە بار و بە شێوەیێکی سووک کارێ خووە بسڤکی کر. بۆ فەرمانە بەلان بە تەنها بەکار نابرێ بەڵکوو بەیارمەتی (بە) پێکدێ: ببە، ببەم، ببا، ببەن، لە بردن وە رگیراوە، ببە، ببم، ببێ لە بوون وەرگیراوە، ببین. لە ڕووی، بەڕاستی: لە ڕووی ڕاستییەوە.

**بەئاگاهاتن:** بێداربوونەوە. ـــ ەوە: بێداربوونەوە.

**بەئاگاهێنان:** بێدارکردن، بێدارکردنەوە، ووشیارکردنەوە.

**بەئاگرگرتن:** بەئاوورڕاداشتن.

**بەئالیڤەدان** (باک.): نرخدانان.

**بەئاواتگەیشتن:** بە ئامانج گەیشتن.

**بەئاواتگەیشتوو:** بە ئامانج گەیشتوو.

**بەئاودان:** بەئاودادان، واتا بەخۆڕایی چتێک یا سامان لە دەستدان یا ماوەی تەمەن و ڕەنجی ساڵەها بەفیڕۆدان.

**بەئەم:** بەم.

**بەئەمانە:** بەمانە.

**بەئەمەدا:** بەمەدا.

**بەئەمجوورە:** بەمجوورە.

**بەئەو:** بەو.

**بەئەوە:** بەوە.

**بەئەوانە:** بەوانە.

**بەئەوجوورە:** بەوجوورە.

**بەئجادن** (باک.): هاندان، ڕق هەڵستاندن.

**بەئجین** (باک.): کفتوکۆ دامرکان.

**بەئۆک** (باک.): ناشیرین، دزێو، ناحەز، چتی خراپ.

**بەبا:** بادار، جێگا، ڕۆژ یا ساڵێکی بەبایەو بای زۆربێ، دێڵەبەبا. بەفاڵ بۆ سەگ و چەقەڵ و پشیلە و بەرازی مێ بەکاردەبرێ، کە ئارەزووی نێرینەی خۆیان بکەن. ـــ بوون: هاتنەبا، واگرتن. (باک.) بابە، باڤۆ، باڤێ، باوکە، زاراوەی مندالانە، کە لە کاتی ئاخۆتنی باوکیاندا بەکاری دەبەن.

**بەبادادان:** چتێک بەدەم باوەدادان، بە خۆڕایی چتێک لە دەستدان.

**بەباف** (ڕۆژ.): کشت بادرا و بۆ دەزوو و بەن و ئیتر.

*

**بەباکردن:** تەتەڵە کردن، چت بە بەر هەوادا کردن.

**بەبان:** مندالان، بەبەگەل، منالگەل. ـــ ی: ئەلۆری، (باک.) تارباری.

**بەبە:** مندالی ساوا و شیرەخۆرە، ساڤا، (باک.) پەڕووپێ، بەبەڵە، بیبیلە، خشکۆک، زاراوەی مندالی گچکەیە بە مندالی ساوای تر دەڵێ. بووکەچینی، (باک.) بۆبک. بڕوانە: بابان. مندالی پێ ژێر دەکرێتەوە.

**بەبەر:** بەردار، داری بەردار. لەبەز، ئەزیاد.

**بەبەغە:** چۆڵەمە، بەرخەبەبە.

**بەبەڵە:** بەبە لە زاراوەی مندالی گچکەیە. ـــ ی چاو: بیبیلەی چاو، بیبکە، (باد.) بیبیک، (جا.) کەنیشکی چاو، کێچک (ڕەوا.) لەنگی، (هەورا) کناچڵەی چەم، کناچڵێ چەمی، بیبۆک، پیبۆک، (باک.) کەچکاچاڤ.

**بەبڕ:** (هەورا.) یووز، بەوور، دڕەندەیێکە وەکوو پڵنگ وایە زۆرتر لە گەرمێنیدا دەژی.

**بەبڕشت:** (بۆ دەخڵ و دان) بەپیت و پێز. زیرەک، ووریا، کارزان، لێهاتوو. دەمڕاست، فەرمانڕەوا.

**بەبک:** مندالی ساوا.

**بەبلە:** بڕوانە: مندالی ساوا، بەچکە.

**بەبلەبەبان:** منال، بەچکە، مندالی شیرەخۆرە.

**بەبلوونە:** بووکی گچکۆڵەی قامیشن، کە مندالان لەکاتی بووک بووکێنیدا لە تەنیشت بووکی گەورەی قامیشینی دادەنێن.

**بەبلی بەبان:** بڕوانە: بەبلەبەبان.

**بەبۆکە:** بووکێکە لە وێنەی مندال لە شووشە یا لاستیک یا قامیش دروستدەکرێ، لە ڕووی خۆشەویستییەوە بە مندالی ساواش دەووترێ ـــ.

**بەبۆلە:** بڕوانە: بەبۆکە.

**بەبۆن:** بۆندار.

**بەبێ:** (بابا.) جگەلە، (هەو.) جکە، بێجگە، بێ لە، هێ لە، بەبێ ئەوەی بیبینم خۆشم دەوێ، من دلگرتی ژ نە دیدە.

**بەپا:** بەپێ، بەلەپا، بەلەپێ، خۆشڕەوت.

بەپشتەوەکەوتن: بەپشتەو خەفتن، بەپشتەوگەفتن.

**بەپێ:** مرۆڤێکە لە ڕێگا ڕۆیشتنێدا ئازا و خێرابێ.

**بەپێچ:** فێڵباز. ڕێوی ـــ ە.

**بەپیرەوەچوون:** بەپێشوازییەوەچوون.

**بەپێغەمبەر:** سووێندەکە بەناوی پێغەمبەری.

**بەپێوە:** (بابا.) بەپیانەوە، بەڕاوەستانەوە، (باد.) ژپیا، ژپیاڤە، ژپیڤە.

**بە پیرەوەچوون:** بە پێشوازییەوە چوون.

**بە پێغەمبەر:** سوێندێکە بەناوی پێغەمبەری.

**بەپێوە:** بەپیانەوە (بابا.) بە ڕاوەستانەوە، ژ پیا، (باد.) ژ پیاڤە،ژپلە.

**بەت:** (بابا.، جا.) مراوی، پەلەوەرێکی ئاوییە هەروەکوو مالی هەیە دەشتیشی هەیە هی مالی لە ئی دەشتی گەورەترە، ئەوانەی دەشتی بە زۆری بۆرکارن بەلان ئەوانی مالی سپی و ڕووت و کونجڕن، نێرەکەیان سەری سەوز و مێیەکەیان بۆرە، بۆیە پێی دەڵێن بۆرچین. (باک.) نەخوێندەوار، بێ ئاگا.

**بەتار** (باک.): بەدبەخت، شووم. ڕووناکی چاو، (بابا.) چەتال، بینایی چاوان.

**بەتارڤک** (باک.): نقووم بوونی کەشتی، ڕۆچوونی گەمێ.

**بەتارە** (ئەردە.): لفکە، فلچە، گرکچە، شانەی تەوونگەر و جۆلای.

**بەتاک** (کە.): ئاوەڵە، (دزە.) والا، (کە.) سەربەتاک.

**بەتاڵ:** بێکار. (زا.) چۆڵ، خاڵی، حەتاڵ، پووچ، پووت، فش، ڤالا، هۆڵۆڵ، هۆڵ، هێسا، (هەورا.) باهر، ئامان و یا خانوو و دوکانی ـــ: خالی. مرۆڤی بێکار. ـــ بوون: چۆڵ بوون. ـــ کردن: خاڵی کردن، ڕەوارتن.

**بەتاڵیی:** چۆڵی، ئاستی چۆڵی.

**بەتاڵی:** ڤالاهی، خاڵی. بێکاری.

**بەتان** (باک.): بەری کەوا، ئاستەر.

**بەتاناچوون:** بەتان و پۆداچوون.

**بەتاناهاتن:** لێدوانی چاکە و خراپەی چتێک یا کەسێک بە دوور و درێژی.

**بەتانە** (هەورا.): بەری کەوا، دیوی ژوورەوەی کەوایە. چریش و ئاردەداری دارتاشان دەگرنەوە بۆ گرتنی درز و کونان.

**بەتانوپۆداهاتن:** بەتاناهاتن، بەتان و پۆواهاتن.

**بەتانیە:** بەتانی، جوورە پێخەفێکی ئەستووری خوری تەنراوی سوواوەیە، پەتوو.

**بەتانی:** پەتوو، بەتانیە.

**بەتاو:** بەپەلە، بەتاڵووکە.

**بەتەر:** بەدتر، خراوتر، خراپتر.

**بەتەقەکەوتن:** دەست هەڵگرتن لە چتێک لە شەرمان.

**بەتەڵەب:** بەفاڵ، هەر وەکوو لە کوردەواریدا (بەفاڵ)ی بۆ ماکەر بەکار دەبەن بەلاّن(تەڵەب) یش بۆ ماین بەکاردەبرێ.

**بەتەن** (باد.): بەتەن، بەندەنی کێوان.

**بەتەنگەوەبوون:** دەربەست بوون، مەبەست بوونی چتێک، دەربایستی.

**بەترە:** نەخۆشییێکی چاوە، تەڕاخومە.

**بەترەڤ:** گەنجێکە بەدخوو و بەدکرداربێ، کاری خراپە بکا، کەلەلا، خراو، هەڵشە، (ئەردە.) چتی لە کارکەوتوو. لە کیس چوو، میوەیێکە برزێت و بۆگەن بووبێ.

**بەترپێر** (باک.): بەسرپێرێ.

**بەترپێرار** (باک.، دەر.): بەسرپێرار.

**بەتلانە** (باک.): کاتی پشوودان.

**بەتلاندن** (باک.): ماندوو و شەکەت کردن، (موک.) لەناوبردن، لەدەست دانی چت.

**بەتلە** (هەورا.): ساوار، ساوەر.

**بەتلین** (باک.): ماندووبوون، شەکەت بوون.

**بەتۆرە:** پەلیار، بەشێواز.

**بەتوون:** بەدۆزەخ، بەجەهەننەم، قیرەسیا، ئەتوون: جەهەننەمە. لە (بەتوون)دا، (ئە)یەکەی لێ فڕێ دراوە.

**بەتوویکڵ:** ڕووشەی دوو واتا دار.

**بەتیە** (کۆ.): جبە، عەبا، عەبای هاوینییە، کە بە زێڕ دەچنرێ.

**بەتێبەتێ** (کۆ.): دارەدارە، پەتێ پەتێ، باوەش بۆ منداڵێکی دەکرێتەوە، کە تازە دارەدارەی بکات و پێی دەڵێ بەتێبەتێ ئەویش دێتە نێو باوەش.

**بەتێشت** (باد.): ئاووس، زگپڕ، تۆڵدار، (بۆ ئافرەتە).

**بەجا:** بەجێ.

**بەجەرگ:** بدەک، ئازا، زاتدار، بەزات، چاونەترس.

**بەجەم** (دەر.): قایم، پتەو، توند، مەحکەم.

**بەجگە:** بێجگە.

**بەجنەخووێر:** ناوی شارێکی کۆنی کوردانە لە نێو هەڤێرکادایە، باجنا، بەجنەوی، بەشنەوی ئێلێکی کۆنی کوردانە لە مێژوودا باسی وان زۆر کراوە: (ابن الاثیر) دەڵێ (بشنوی)، (تاریخ الخمیس و هێندێک مێژوو نووسی تر پێی دەڵێن (جن)، (باجن)، (بەجن)، (بەشن)، (بەژن).

**بەجووج:** زۆر بلێ، داوێن پیس.

**بەجێ:** وەجێ، پەسند، بجە، کەتن جە، گوفتار یا کردارێکە، کە لە جێگای خۆیدابێ. ـــ هێنان: پێکهێنان، ئەنجامدان. ـــ هێشتن: هێشتنەوە، لێ گەڕان، مارزۆ. ـــ هێنەر: وەجێ هێنەر. ـــ هێنراو: وەجێ هێنراو. وەجێ، پاوەجێ، پایەدار.

**بەجێگە:** بەجێ، دروست، پەسند، لە جێگەی خۆی، بەڕاستی.

**بەجێگە هاووردن:** بەجێ هێنان.

**بەجێمان:** دوواکەوتن، پاشکەوتنی چتێک لە چتێکی تر.

**بەجێماو:** دوواکەوتوو.

**بەجێ هاتن:** جێ بە جێ بوونی کار و کردار.

**بەجێ هانین:** بەجێ هێنان.

**بەجێ هێشتن:** وازلێ هێنان، بەلاوەنان، لێگەڕان، وازهاووردن، بووراردن، دەڤ ژێ بەردان، دوواخستنی چتێک و جووێ بوونەوەی لێی.

**بەجێ هێنان:** بەجێگە هاووردنی نوێژ و ئیتر، پێکهێنان، ئەنجامدان، بەجێ هانین، جێ بەجێ کردنی کار و بارێک. بە جێگە هاووردنی پەیمان و کار و باری تر.

**بەچ:** بێچوو، جوجیلە، بەچکە، شەڵغە.

**بەچاوەوەبوون:** بەچاوی پیسەوەبوون، تووشی زیان بوون بەهۆی چاوی پیسەوە.

**بەچاوەوەکردن:** لە چاوبردن، چاوی پیس هەڵێنان بە چتێک و هەڵپەرداوتنی.

**بەچاوداداننەوە:** بەڕوودادانەوە.

**بەچاوکردن:** چاوتێ بڕین. بەدی کردن، وەدی هێنان.

**بەچە:** منداڵ، بەچکە، بێچوو، مناڵ. هەتیو، لووسکە، بێ ڕیش. (لو.) زاوا، بووک.

**بەچەباز:** منداڵباز، هەتیوباز. ـــ ی: منداڵبازی، هەتیوبازی. نەخۆشی گسکەی منداڵانە.

**بەچەخستن** (فە.): بەرهاوێژتن.

**بەچەخۆرە:** دەردێکە تووشی گیانداران دەبێ، ئیتر هیچ کاتێکی تێرناخوات.

**بەچەدان** (فە.): منداڵدان.

**بەچەواز:** هەتیوباز، منداڵباز. ـــ ی: هەتیوبازی، منداڵبازی. (کە.) چاوقووڵکە، چاوئێشەیەکی بێ چارەیە.

**بەچک:** بەچکە. ڕوو، چارە.

**بەچکە:** بەچە، بێچوو، منداڵ، (دەر.) وەچکە، بێچووی گیانداران. ـــ ئاسک: کارمامز، بێچووە ئاسک. ـــ ئاهوو: بەچکە ئاسک. ـــ خووگ: کوودەڵەبەراز، بێچووە بەراز. ـــ سەگ: توتکەسەگ، تووتک، تووتەکۆڵە، گوجیلەسەگ. ـــ شێر: بێچووە شێر، شێرکوڵ، شێرکۆڵە. ـــ کەو: بێچوە کەو. ـــ کەروێشک: بێچووە کەروێشک. ـــ کتک: بێچووە پشیلە. ـــ کۆتر: بێچووە کۆتر. ـــ م: بەڵکم، بەڵکوو، بەشقەم. ـــ مار: بێچووە مار. ـــ مەلیچک: جووچکە چۆلەکە. ـــ مەیموون: فەرخە مەیموون. ـــ مشک: فەرخە مشک. ـــ وورچ: پارکۆڵە، فەرخە وورچ.

**بەچکوو:** بەڵکوو، بەشقەم، بەڵکم.

**بەچنگ:** گیاندارێکە، کە بە پچڕ بێ لەپەیدا کردنی چتاندا.

**بەچوو:** بێچوو.

**بەچووە:** بێچوو.

**بەچوولە:** بێچوولە.

**بەحەشت** (باد.): بەهەشت.

**بەحەوت ئاوشۆڕاوەتەوە:** بەحەفت ئاو شۆڕیاگەوە، بێ شەرم، بێ ئاو ڕوو، کاوڵی.

**بەحت:** گێج، گێژ، مات، سەرگەشتە.

**بەحشینک** (باد.): هەناری نەگەیشتوو.

**بەخ** (باک.): شانازی، فیز. ـــ کردن: شانازی کردن. بەه، پەه، پەخ، فەه، خووەش. ئافەرین. بۆ بەسەر ڕۆیشتنیش بەکاردەبرێ.

**بەخەبەر:** بە ئاگاه، نەنوستوو، بێدار.

**بەخەڵ** (ڕۆژ.): باخەڵ، ئەو بەتاڵییەیە لە نێوانی کەوادا، کە سەرسینگ و کەلەکەی دەگرێتەوە، باوەش.

**بەخەڵفرۆش:** ووردەفرۆش، خوردەفرۆش.

**بەخەمکردن:** گەورە کردن و پەروەردەکردنی چتێک.

**بەخبەخ:** خۆشخۆش، بەهبەه، کشکش.

**بەخت:** نەرد، باو، بای، بەش، ناوچەوان، چارە، هات، نێوچاوان، کامڕەوایی، کامڕانی، هیر، کام، کۆس، کۆست، پەل، دەرب، چارەنووس، نگین، فریشتە، هەسارە. (فە.) بێ ـــ: بەدبەخت، (باک.) ناپاک، تەپڕەش، دڵڕەش، چارەڕەش. ئابروو، ناموس، لەسەربەختێ تە بێ: لەسەر شەرەفی تۆ بێ.

**بەختا:** بۆتا، ناوی ئێلێکی کوردی ناودارە، جزیرا بۆتا، بەدرخان پاشا میری ئەو ئێلەی بووە.

**بەختان:** بەخت هێنەر.

**بەختە:** بەران و سابرێن، خرت.

**بەختەباران:** بارانێکە لە بەهاراندا بۆ بەختی خەڵک بارێ، جۆزەردان، بەختەباران، مانگی مایسییە، کە ٣١ ڕۆژە، مانگی دووەمی بەهارییە.

**بەختەمام** (زا.): مەردومی دەستپاک و ڕاست گۆ و دڵسۆز. ـــ ی (زا.): دەستپاکی، ڕاستگۆیی، دڵسۆزی.

**بەختەوار** (زا.): مەردومی هێمن و دەستپاک و خاوەند دڵ و دەروون.

**بەختەواران** (هەورا.): بەختەباران.

**بەختەوەر:** بەختیار، (باک.) بەختکەنۆک، کامڕان، بوختیەیش، خودان بەخت، بەدڵخوواز گەیشتوو. ـــ ی: بەختیاری، خودانبەختی، خۆشبەختی، کامڕانی، هات، هێوان.

**بەختدار:** بەختیار، خۆشبەخت. ـــ ی: بەختیاری.

**بەختڕەش:** چارەڕەش، بێ بەخت، بەدبەخت، کولۆڵ. ـــ کردن: بەخت بردنەبەست. ـــ ی: چارەڕەشی.

**بەختکەنۆک** (باک.): بەختەوەر.

**بەختکەنۆکی** (باک.): بەختەوەری.

**بەختکردن:** چوواندن، خەرجکردن، بڵاوکردنەوەی دراو. چوونەوەی ڕەنگ.

**بەخت نەمەنە** (هەورا.): بەخت وەرگەڕاو.

**بەخت وەرگەڕان:** چارەڕەش بوون.

**بەخت وەرگەڕاندن:** چارەڕەشکردن.

**بەخت وەرگەڕاو:** کۆست کەوتوو.

**بەختیار:** کامڕان، بەختەوەر، بوختیەیش، (باک.) بەخت کەنۆک، خودان بەخت، بەدڵخوواز گەیشتوو، خاوەند بەخت. ـــ ی: بەختەوەری، خودان بەختی، خۆشبەختی، کامرانی، هات، هێوان. هۆزێکی گەورەی کوردە لە کوورێستانێدا.

**بەخچە** (باک.): باخچە.

**بەخچەڤان** (باک.): باخچەوان.

**بەخزمەت:** خزمەتگوزار.

**بەخسەم** (فە.): کوللێرە، کێک.

**بەخش:** دان. بڵاوبوو. بوورین. بەش.*

**بەخشان:** بەخشین، بەخشش.

**بەخشاندن** (باک.): بەخشین.

**بەخشایش:** بەخشش.

**بەخشەر:** لێ بوور، چاوپۆش، هشازا.

**بەخشران:** ئازادکران، لێ بووران.

**بەخشراو:** ئازادکراو، تیلە.

**بەخشش:** دەسوازی، دەسەنە، (ئەردە.) شاخسی. خەڵات، بەخشیش.

**بەخشندە:** چاوپۆش، لێ بوورەر، دەڤتەر، بەخشەر، دڵفراوان، کەسێکە زۆر پارە یا چتمەک بە خەڵک بدات. ـــ یی: دەڤتەری، بەخشەری، دڵفراوانی، بەزۆری پارە و چتمەک بە خەڵک دان.

**بەخشیش:** بەخشش، چێشتانە، خەڵات، (باک.) پێمزک، چتێکە گەورەیەک بیدا بە بچووکێکی، بە پیاوەتی پارە یا چتمەک بەخەڵک دان.

**بەخشین:** خەڵاتکردن، پارە یا چتمەک پێشکەش بە کەسێک کردن بە خۆڕایی، چاولێ پۆشین، لێ بوورین، خۆشبوون، بەخشان، بووردن، وەشکردن، بوورین، بوواردن، لێ خۆشبوون، بووراندن، جەبە، نۆبەبەخش، (باک.) دلێ خوەڤەکرن، (هەورا.) چنەویەرد.

**بەخشینەوە:** بەشینەوە.

**بەخۆداهاتن:** خۆداڕژتن و گەورەبوون.

**بەخۆژیو:** بڕوانە: بەخۆوەژیو.

**بەخۆکردن** (ئەردە.): بەخێوکردن.

**بەخۆنازین:** بایی بوون، شانازی بە خۆکردن.

**بەخۆوە:** لەسەرخۆ، بەهێز و توانا.

**بەخۆوەبەستن:** یەکێک بە خۆیەوە ببەستێ لە کار و فەرمانێکیدا، بەخۆوەبەستن.

**بەخۆوەبوون:** قەڵەو وتێک سمڕاوی.

**بەخۆوەژیو:** زیرەک، وریا، ئازا، کارین، کەسێکە بەرەنجی شان و قۆڵی خۆی بژی.

**بەخودا:** سوویندەکە بە ناوی خولاّ، بە یەزدان.

**بەخۆیەوە:** خۆیەخۆی. ـــ دەبەستی: بە خووەیە و ئەوەسێ.

**بەخویکردن** (ئەردە.): بەخێوکردن.

**بەخێر:** خێردار.

**بەخێرچی:** خووات لەگەڵ بێ، لەوەڵامی کەسێکیدا دەکوترێ، کە لەکاتی ڕۆیشتنێدا، ماڵاوایی بخووازێ.

**بەخێرهاتن:** خۆشهاتن. ـــ کردن: خۆشهاتن کردن.

**بەخێرهاتی:** خۆشهاتی، کاتێک بەکاردەبرێ، کە یەکێک بێتە لات و ڕۆژباشی و یا شەو باشی بکات تۆش دووای وەڵامی ڕۆژباشی بەخێرهاتنی دەکەی.

**بەخێو:** خاوەندار، خوداندار، بەخاوەند. ـــ کران: پەروەردەکران، حاملان. ئیوەت، خوویدار. ـــ کردن: حاملاندن، بەرێ بردن.

**بەخێوبوون:** بەرێ چوون، پەروەردەبوون.

**بەخێوکار:** بەرێوەبەر، حاملێنەر، پەروەردەکار.

**بەخێوکردن:** پەروەردەکردن، (دەر.) بەخاوەندکردن، (هەورا.) وەیکەردەی، ڕەنێوهێنان، بەرهەمهێنان، ڕاگرتن، بەرێ بردن، خوویداری، خویداری کردن، بەناوهاووردن.

**بەد:** خراو، گەند، گەن، (لو.) چەپەڵ، خراپ، خرا، گەنەژە، گەندەژە، (ڕۆژ.) توون.

**بەدئەخم** (ئەردە.): ڕووگرژ، ڕووترش، ناوچاوترشاو.

**بەدئەکەوتن:** نەخۆشکەوتنی ئاژاڵ و ماڵاتانە لە زۆر خواردنی جۆ یا دانەوێڵە، چووار پەلی ڕەق گۆت دەبێ و ناتووانێ بجووڵێ.

**بەدبیکردن:** ناڵەناڵ و نکەنکی نەخۆشە بەدەم نەخۆشییەوە.

**بەدئەنجام:** دووارۆژ شووم. ـــ ی: دووارۆژ شوومی.

**بەدئەندێش:** بەدخووا، بەدخوواز. ـــ ی: بەدخووازی.

**بەدەر:** بێجگە، جگە، بێ لە، بەلاّن بەتەنێ و یا لەسەرەتای ڕستاندا بەکار نابرێ بەڵکوو دەخرێتە نێوەڕاستی ڕستانەوە: لەوی ـــ م نەدیت.

**بەدەردخوواردن:** بەکارهاتن، بەکارخوواردن.

**بەدەس:** بەدەست.

**بەدەس ئاوخوواردن:** بەدەستی ئاوخوواردنەوە.

**بەدەسەوەبوون:** بەدەستەوەبوون. نزیک بوون، نزیکی تەواوبوون. خەریک بوون.

**بەدەست:** بەدەستەڵات، مەردومی دەستەلاتدار.

**بەدەستەلاّت:** خاوەن، دەسەلاّت.

**بەدەستەوەبوون:** بەدەسەوەبوون.

**بەدەستەوەدان:** دانە دەست، دانی چتێک بە یەکێک لە ڕووی زۆرداری یا فێڵ و فەرەجەوە: کابرا پیاوکوژەکەی دا بەدەستەوە. لاوازبوون و لەکەمی دان: فیسارەکەس بەم نەخۆشییە داویە بە دەستەوە.

**بەدەستگرتن:** برێتییە لە چوونی مێرد بۆلای ژنی خۆی یەکەمین جار.

**بەدەس ڕێگەڕۆیین:** لەسەر چنگان ڕۆیشتن، سەر چنگانە.

**بەدەق:** تەواو، نەگۆڕاو، دەقدار، گیاندار و سەرزاریی بە کەیف، ساز، ئامادە، ڕازاوەوە.

**بەدەڵ:** ساختە، دەستکرد.

**بەدەم:** قسەزان، قسەڕەوان، بەدەم و پل، بەزمان، بدەڤ، سەرزارەکی.

**بەدەمار:** ئازا، سەرشۆڕنەکەر، بەهەوا.

**بەدەمەوەدان:** لەدوودان، لغاوبۆشل کردن، دەرخوواردانی چتێک بە چتێکی ترەوە، ووردەووردە ئەو پووش و پەلاّشەی بدە بەدەم ئاورەکەوە.

**بەدەمەوەڕۆیین:** سەرەنگرێ بوون، هەڵەنگووتن.

**بەدەم و پل:** بەدەم، بەزمان، بدەڤ.

**بەدەم و دوو:** قسەزانی قسەخۆش.

**بەدەم یەکەوە:** بەسەریەکەوە، بەدەم یەکەوە، پەیوەست.

**بەدەن:** ئەنام، ئەندام، ناوگڵ، تووش، لەش، قالب، مر، بەندەن، تەن، بەشەن، (باک.) بەچک، جەستە، تەن، کلۆخ، لەخت، (زا.) شوورە، دیواری بەرز.

**بەدەنی:** لەشی، تەنانی، (باک.) بەشەنی.

**بەدەو** (مەک.): ئەبەز، خۆشبەز، زۆر غاردەر، گیانداری چەسپان. (باک.) بەدەبدەبە، زۆر جووان. (هەو.) خێرا، گورج، توندوتۆڵ.

**بەدەوراهاتن:** گردگەڕیان، بەدەوراچەرخیان.

**بەدەوری خۆهەڵاتن:** خۆجووان کردن، خۆڕازاندنەوە.

**بەدبەخت:** کێمکەتی، گوین، (باک.) کەربەتلی، کەزیکوور، دلبێش، (باک.) کزۆک، چارەڕەش، ڕۆژڕەش، خۆڵبەسەر، خاک بەسەر، پرنسی، قەمشقە، کلۆڵ، بەلەنگاز، کولۆڵ، بۆژە، (باک.) پەپووک، بووژما، بووژمان، بەتار، (باک.) بلەنگاز، پەرێشان، خەمناک، شەلب، هەزار، بێ دەستەلاّت، سەلاّ، گرداف، وێزار، بەدچارە، بەدنگین، سیاتاڵە، سیاچارە. ستەمکار، زۆردار، زۆرخراپ.

**بەدبەخت خۆم:** خاک بەسەرخۆم، دەستەشکاوخۆم، خووەلی بسەرێ من.

**بەدبەختی:** نامەد، بەدچارەیی، بەدنگین، دامەوی، هەژاری، ژیواری، شەلشی، کلۆڵی، مەینەتی، چارەڕەشی، بێ چارەیی، بەلەنگازی، ڕۆژڕەشی، سەلا، گرداف، بۆیلات، پارس، پارسەکی.

**بەدبەسەن:** بەدبسان.

**بەدبدێ:** قەرزکوێر، وام کوێر.

**بەدبسان:** بەدبسێن.

**بەدبسێن:** لە ئەستاندنەوەدا چیرەدرێژ.

**بەدبۆ:** بۆدرن، درندار، بۆگەن. ـــ ی: بۆدرنی، بۆگەنی.

**بەدبێژ:** بەدگۆ. ـــ ی: بەدگۆیی.

**بەدبین:** کەسێکە هەمیشە بەخراپە تەماشای دووارۆژ بکات. ـــ ی: بەخراپ ڕووانینە دووارۆژ.

**بەدپەسن:** دژپەسند، دێرپەسند. ـــ ی: دژپەسندی.

**بەدپووز:** بەدچارە، بەد سەکوت. ـــ ی: بەدچارەیی.

**بەدتاڵە:** بەدبەخت.

**بەدتام:** بێمەزە، بەدمەزە، بێ تام، ناخۆش. ـــ ی: بێ تامی، ناخۆشی.

**بەدتەرەف:** بەرتەرەف، لە بەین چوون.

**بەدتوخم:** مەردومی ناڕەسەن.

**بەدچارە:** ئێسک قورس.

**بەدچیرە:** بەدشێوە، ناشیرین، ناحەز، دزێو. ـــ یی: ناحەزی.

**بەدحاڵ:** بەدژیوار. ـــ ی: بەدژیواری.

**بەدخوو:** مەجوجە، نەفاچڵ، قژژۆک، مەندەمۆور، لاسار، مەندەبوور، پلمەروو، بسگووم، بەدڕەفتار، پرووز، بەدڕەووشت، بێماد، مادەکری.

**بەدخووا:** بەدئەندێش، بەدخوواز، بەددڵ.

**بەدخوواز:** دەخسۆیی، دخسین، بەدخووا، بەدئەندێش، خووازۆک، چەسپخووس. ـــ کەسێکە خراپەی مەردومی بووێ. ـــ ی: بەدخووازی، بەدئەندێشی، چاو پێیهەڵنەهاتن، بێ مادی، (باک.) پلمەروو، ویستی خراپ، چەپخووسی، چاوپێ هەڵنەهاتن، دەخس، دەخساندن.

**بەدخوویی:** سگووم، (باک.) پرووزی، بەدڕەووشتی.

**بەددڵ:** دڵپیس، بەدنیهاد. ـــ ی: دڵپیسی، بەدنیهادی.

**بەدڕا:** گاوور، لەئایین وەرگەڕاو. ـــ یی: گاووری.

**بەدرە:** شارێکی کوردانە لە خووارەوەی بەغدایە لە نزیک شاری عمارە.

**بەدڕەسەن:** ناڕەسەن، ناکەس. ـــ ی: ناکەسی.

**بەدڕەفتار:** بەدکردار، بەدخوو، بەد. ـــ ی: بەدکرداری.

**بەدرەقە:** ڕابەری شارەزا، ڕێ نیشاندان. ـــ کردن: ڕابەری کردن، بەڕێ کردن، ڕەوانەکردن.

**بەدرەک** (باک.): سەرسەخت، سەرڕەق.

**بەدرەمە:** جوورە هەنگێکی کێوییە لە هی ماڵی بچووکترە و هەنگوینەکەشی لە هی ماڵی جیرترو خۆشتریش و نرخدارترە پێیی دەڵێن (شەمەتلێنکە) یا (شەمەترێنکە) لە هەنگوینی تر زۆر خۆشترە لەبەر کەمی و نایابی زۆر بەنرخە.

**بەدڕەووشت:** بەدخوو، بەدڕەفتار. ـــ ی: بەدخوویی، بەدڕەفتاری.

**بەدرخان:** میری بۆتانە، کە بنەماڵەی پادشایەتی کوردستانی باکوور بەوی کۆتایی هاتووە واتا پادشای هەرەدووایی ئەو هەرێمەی بووە.

**بەدڕۆژ:** کەسێکە لە ڕۆژیدا خراو و لەشەوێدا باش بێ. ـــ ی: بەڕۆژخراو و بەشەو چاکبوون.

**بەدزەڕ** (ئەردە.): ئێسک قورس، ڕەزاگران.

**بەدزمان:** زمان پیس، کەسێکە چاکەی بەسەر زمانیدا نەیەت. ـــ ی: زمان پیسی.

**بەدزووان:** بەدزمان. ـــ ی: بەدزمانی.

**بەدسەر:** سەرکێش. ـــ ی: سەرکێشی.

**بەدستان:** بەدبسێن.

**بەدسرشت:** کەسێکە لەزگماکییەوە بەدخوو بێ.

**بەدسروشت:** بەدخوو، بەدگەوهەر.

**بەدشەو:** کەسێکە شەوانە خراپ بێ.

**بەدشکڵ:** بەدشێوە، سەروسەکوت، ناشیرین.

**بەدشێوە:** بەدشکڵ.

**بەدفەڕ:** شووم، بەدرودم، (کە.) قەشقە، کەراقی، نەها، بەتار، بەدووم، بێ فەڕ، ناپیرۆز. ـــ ی: شوومی، قەشقەیی.

**بەدفەساڵ:** ڕەزاگران، ئێسک قورس. ـــ ی: بەدقەوارە، بەدقەڵافەت.

**بەدکار:** بەدکردار، هەزارفەند، گەلاج، کردەوەبەد، دز، حیز. ـــ ی: بەدکرداری، گەلاجی، هەزارفەندی، کردەوەبەدی.

**بەدکردار:** بەدکار. ـــ ی: بەدکاری.

**بەدگۆ:** بەدزووان، زمان پیس، بەدوێژ، کەسێکە بە باشی باسی کەس نەکات.

**بەدگۆشت:** کەسێکە گۆشتی لەشی ناشیرین بێ و یان برینی لەشی درەنگ چاببێتەوە، گۆشت پیس.

**بەدگومان:** کەسێکە بیری لە بارەی مەردوماندا باش نەبێ، دڵپیس، دڵچەپەڵ. ـــ ی: بیرباش نەبووی لە بارەی مەردوماندا، دڵ چەپەڵی.

**بەدگۆیی:** زمان پیسی، بەد وێژی، بەدزوانی.

**بەدگیل:** ناشیرین، ناحەز، دزێو. ـــ ی: ناشیرینی، ناحەزی، دزێوی.

**بەدل** (باک.): بەش، بەند.

**بەدڵ:** بە ڕاست. بەخشندە. *

**بەدڵەوەنووسان:** خوواردن، خوواردنەوەیێکە بە بێ نیگەرانی و ترس و هەراس بخورێ لە باری حەسانەوەدا.

**بەدڵ بوون:** بەدڵەوە نووسانی چتێک، پەسندکرن.

**بەدلغاو:** بەدسەر، سەرسەخت، کەللەڕەق.

**بەدلیس:** بڕوانە: بتلیس.

**بەدمەست:** سەرخۆشێکی بێ هۆش، بەدمەس.

**بەدمەس:** بەدمەست.

**بەدمەستی:** بێهۆشییە بە هۆی زۆر سەرخۆشییەوە.

**بەدناو:** بەدنام، کەسێکە بە خراپە نێوی زڕابێ، ترۆ، ڕیسوا.

**بەدناوکردن:** ناو بەخراپە زڕاندن.

**بەدناوی:** بەدنامی، بەخراپە زڕانی نێو، ترۆیی، ڕیسوایی.

**بەدنگین:** بەدبەخت، چارەڕەش، سیاچارە، ڕۆژڕەش. ـــ ی: بەدبەختی، چارەڕەشی.

**بەدنما:** ناشیرین، دزێو، ناحەز.

**بەدنمەک:** سپڵە، نانکوێر، نانکۆر، بێ بەخت، بێ نەمەگ، کەسێکە لەبەرانبەر چاکەدا خراپە بکات، تاوان، دڵڕەش، بەپەڕەش، پێ نەزان. ـــ ی: سپڵەیی، نانکوێری، بێ بەختی. ـــ کردن: خشانەلاوە.

**بەدنمەگ:** بڕوانە: بەدغەک. ـــ ی: بڕوانە: بەدغەکی.

**بەدنێو:** بەدناو، بەدنام، (باک.) ناڤنۆ. ـــ ی: بەدناوی، ناتۆرە، نەتۆرە.

**بەدنیهاد:** بەدسروشت، بەددڵ. ـــ ی: بەدسروشتی.

**بەدوواوەروویگ:** پاشەوپاش کشاوەوە.

**بەدۆ** (باک.): ناوی نێرینانە.

**بەدوواوەڕۆیین:** پاشەوپاش کشانەوە.

**بەدوودم:** بەدروم، شووم، بێ فەڕ، دژبڕ، دوومۆر. ــ ی: شوومی.

**بەدوورزانین:** چاوەڕێ نەدەکرا.

**بەدووم:** شووم، بەدرودم.

**بەدوێژ:** بەدگۆ، بەدبێژ، بەدزووان، زووان تاڵ. ــ ی: بەدگۆیی، بەدبێژی، بەدزووانی.

**بەدێ** (باک.): ناوی نێرینانە.

**بەدی:** خراپە، گەندی، خراوی. ــ کردن: خراپەکردن. دیتن؛ بە دیم کرد. بەڵێ، ئاری؛ خوێندت؟ بەدی خوێندم. ــ بوون: خراپ بوون. بە دیارکەوتن.

**بەدیارەوەبوون:** ئاگاداری کردنی چتێک.

**بەدی کردن:** بینینی چت لە دوورەوە، بەچاوکردن، ڕەچاوکردن، وەدی هێنان، (هەورا.) بەسەرکردنەوە، پێکەوتن، وێکەوتن، منەکردن.

**بەدیل** (باک.): فێڵ، نۆبە، نۆرە.

**بەدێلفانی** (باک.): یارمەتی.

**بەر:** کورتکراوەوەی ناوی بەرزنجەیە بۆ سەر چاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە. (کەل.، زەن.، باک.) پێش بۆ کاتە، بەرلەتۆ: لە پێش تۆدا، بەرتر: پێشتر، بەری نیوەڕۆیە: پێشی نیوەڕۆیە، لەبەر چاوی تۆم دانا: لە پێش چاوی تۆم دانا، بار، بەر. بەری داران، میوەی دارانی بەردار وەکوو: سێو، هەنار، قەیسی، هەڵووچە، گوێز و بادام و ئیتر، منداڵێکە، بێچووێکە لە نێو زگی دایکیدابێ. منداڵ، بێچوو: بەراڤێتی: بەراویژتن، ژنەکە بەری هاویژت. (باک.) بەرد، کوچک، تەوەنی. (هەورا.) دەرگا، دەرک. پێش، بەرگرتن: پێشگرتن. پێشەوە، لای پێشەوە، بەرگەدە. تووکی بەری مرۆڤان، مردارەبەر، بیبرۆڤ، مووچک، (باک.) ریف. مرداری، ئازاد، سەربەست، بەرەڵا، بەربوون: ئازاد و سەربەست بوون. ــ دان: ئازاد و سەربەستکران هەوسارەکەی لە دەست بەر بوو. توانا، بەرگە، تاقەت، بەرانبەری، بەرگرتن: بەرگەگرتن. بەڵغ هی سەماوەر و ئیتر. (شەم.) ڕوو: بەرلە من کە: ڕوو لە من کە. ــ ی خۆدان: ڕووتێکردن، تەماشاکردن. سەر، لەپ، بەری دەستی: لەپی دەستی. ژێر بەری پێ: ژێر و بنی پێ. هۆ، مایە، بۆنە، سەبارەت، لەبەر ڕاسپاردەکەی تۆ هاتووم: بە هۆی ڕاسپاردەکەی تۆوە هاتووم. بەش، پەش: بەرە دروێنەیەک: بەشە دروێنەیەک، بەشەنان: بەرەنان. کەنار، پەڕ، لا، لان، ئەوبەری چۆمی: ئەو پەڕی چۆمی، ئەو بەر لەم بەرە خۆشترە. یاد، ئەزبەر، وانە و هەڵبەست لەبەر کردن: وانە و هەڵبەست لە یاد گرتن. پۆشین، لەش، تەن، بەرگ لەبەرکردن: جل پۆشین. بەرینی، بەرینایی، پانایی، ئەو چیتە بەری پانە. مەمک، لەمە. سینگ، سینە. خوری، بەرکرن: خوری لە پشتی ئاژاڵان کردنەوە. گوللە: بەرێ تفەنگێ، بەرێ تۆپێ: گوللەی تفەنگ و گوللەی تۆپی. لا، کن، نک، جەم، بە من ڤاهات: بۆ لای من هات. بۆر (،). پێشەوە: بەردەم، بچۆ بەرەوە: بڕۆ پێشەوە. بەدووای هەرناوێکەوە بنووسێ دەیکاتە ناوی بکەر: ڕەنجبەر، فەرمانبەر. بەرندە، ئەوکەسەیە چتی بیبات. کەڵ، وەبەرهاتن: بەکەڵ بوون، هاتنەبەر. کۆتایی، ڕێگالەبەرناچێ: واتا ڕێگا دوورە و کۆتایی نایەت. یەکەم، یەکەمین: نۆبەرە. بەرینی، پانایی: بەدرێژی درێژی جاوەکە یەک بەرە. دووبەرە. تیرە، بەرەباب. کورتی: لەبەر بران: کورتی هێنان.

**بەڕ** (هەورا.): بەرە، (هەورا.) لەی، گڵێم.

**بەرا** (باک.): بلا، با، بەڵا، دا، بۆ فەرمانە: بەرا ئازاد بێ: بەڵا ئازاد بێ. (لو.) بەرخ، کارژۆڵە.

**بەرابەر:** بەرانبەر، بەرامبەر، ڕووبەڕوو، (هەورا.) وەراوەر، (دەر.) وەرانوەر، ڕێک، تەراز، چووبەچوو. مێمل، هاو زۆر، هاونەبەرد، هاوتەرازوو. ڕووبەڕوو، دەساندەس. ــ ی: بەرامبەری، ڕێکی، تەرازوویی. ڕووبەڕوویی، دەساودەسی. هاوزۆری، هاونەبەردی، مێملی، هاوتەرازوویی.

**بەرابەرێتی:** بەرامبەرێتی.

**بەرابزن:** نەخۆشییەکی جەرگی بزنانە.

**بەراپیل** (دزە.): بەرامپیل، کۆڵوانە، بەرهەڵبێنە.

**بەرات:** مووچە، جیرە، پسوولە، چەک، حەواڵە ساڵانەو مووچەیەکە گەورە بۆ ژێر دەستانی دیاری دەکات، (باک.) جوورە ماسییەکە.

**بەراتە** (باک.): کەلاک، لاکە تۆپیوێکە، کە لە دەشتا فڕێ درابێ.

**بەراتخۆر:** مووچەخۆر. ــ ی: مووچەخۆری.

**بەراتی:** چتێکە، کە بە بەرات دەدرێ.

**بەراجی:** تیرەیەکی کوردە لە هۆزی سووێسنی.

**بەراد** (باک.): لێدان، تەکان، لەرز.

**بەڕادە** (هەورا.): پایە، (باک.) پێلپەلک. (هەورا.) ــ ی: هەڵکەندن.

**بەراز:** ووراز، خووگ، (فە.) گوراز، خووک، خووگ، (دەر.) وەراز، کەمێک لە گاجووت گچکەترە و کلکی کورتە و دووسمە، بەرازی مێ: دەڕ، مالۆس، ماویەبەراز، مەهوو، (فە.) ساگەوان، بەرازی نێر: یەکانە. بەرازی کێوی، (باک.) بەرازێ کەدی، بەرازی کەوی، (باک.) بەرازی کووی، گورانە. جانەوەرێکی کەوی و کێوی و مل کورت و ئەستوور و بۆزە بە نێرەکەی یەکانە و بە مێیەکەی دەڕ یا مالۆس دەڵێن وەکوو سەگ بە جارێکی چووار پێنج کوودەڵەی دەبێ، بەراز زۆر مێملی کشتو کاڵە بەتایبەتی مەرەزە و جۆ و گەنمەشامی و زۆریش حەز لە بەهی و پیاز و خووگانەی دەکات، هەر زەوییەکی زەلدار و یا زۆر ڕەق و پەتەوبێ گاجووت نەتوانێ بیکێڵێ چەند دانە بەهی یا پیازە خووگانە لەو زەویەدا لە چەند جێگەیەدا دەشارنەوە بەراز بە شووێن بۆنیدا دەگەڕێ تا دەیدۆزێتەوە هەموو زەویەکەی دەکێڵێ بە شەفرەکانی و دەیانخوا و ئەو جار دەڕوات. قیتکایی سەری شاخانە. (خۆ.) بازگە. (هەورا.) قوتکە، لووتکە.

**بەرازا:** ئێلێکی کوردی ناوداره هێندێکی لەکوردستانی سووریە لە ڕۆژهەڵاتی شاری حەلەبییە بەشێکیشی لەناوچەی شاری ئەرزەڕۆمە.

**بەرازە** (دەر.): دارێکە وەبەرچتی قورس بدرێت وەکوو بەرازەی ئاشی. (دزە.) مرخە. ددانێکی ئێستریە، کەڵبە. (باڵە.) داری سووانده. گورگەی خانوو. نوێل، چل مێردە: بازناوی ئاش، کە پێی ئاشی پێ بەرزدەکرێتەوە. دوودانی گەورەو بەرزە وولاخ لەشەش ساڵیدا دەری دەکات. چەند دارێکیشە دەخرێتە بن بەرداشی ژێرەوەی ئاش. (زا.) هەرچتێک، کە چتێکی تری پێ بەرزکرێتەوە بەرازەی پێ دەڵێن.

**بەرازانی:** تیرەیەکە لەو سێ گوندانە دادەنیشن: باڵەکیان، سرێشمە، دێلەزیا، کە کەوتوونەتە ڕۆژاوای باکووری ڕەواندزێوە، (باڵەکیش) یان پێ دەڵێن.

**بەرازخۆر:** تیرەیێکی کوردە لە قەراغ سیروان لە بەستی کوێستانێدا دادەنیشن.

**بەرازۆ** (باک.): بەرازە.

**بەرازی:** هۆزێکی کوردە.

**بەرازی مێ:** دەڕ، ماڵوس، شفرەی نیە.

**بەرازی نێر:** یەکانە، شفرەدارە.

**بەرازۆ** (شەم.): بەرەوژوور.

**بەرازۆتر** (شەم.): بەرەوژوورتر، بڵندتر.

**بەڕاس؟:** بەڕاست؟.

**بەڕاست؟:** بەڕاست؟، ڕاسی. ــ ی: بەڕاسی.

**بەراش** (باک.): باراش، بەرداش.

**بەڕاش** (باک.): ناوی جوورە چۆلەکەیەکییە.

**بەراشە** (باک.): باڵندەیێکە.

**بەراشۆ** (باک.): جلکی چڵکن بۆ شوشتن، (باک.) بەراڤ.

**بەراڤ:** نێلێکی کوردە لە دیاربەکرێ، بالاڤ. (باک.) بەراشۆ، (باک.) جلکی چڵکی (بۆ شوشتنێ). بەرداش، بەراو.

**بەراڤیتن** (باک.): بەرهاویتن، بەردهاویژتن.

**بەراڤیژک:** (موک.) جیاز زێڕەوشان، دیارییێکە لە کاتێکی، کە بووک دەگاتە بەردەرگای زاوای بەسەر بووکێدا دەکرێ و منداڵان هەڵیدەگرنەوە. هەڵوار دیارییێکە لە جەژندا بنێررێ بۆ دەزستان.

**بەراق** (باک.): گەمەیێکی منداڵانەیە.

**بەراکگر** (خۆ.): کۆڵۆوەژ، کۆڵەوەژ.

**بەڕاکردن:** بەدەو، بەغاردان.

**بەرامای** (هەورا.): هاتنەدەر، دەرهاتن.

**بەرامە:** بۆنی زۆر خۆش، بۆنی ڕەوان.

**بەرامبەر:** بەرانبەر، بەرابەر، تەراز، ناقار، حاست، راست، (دەر.) وەرانوەر، وەراوەر، (هەورا.) ڤەراڤەر، (ڕۆژ.) بەرپۆز، بەربەهەڤ، (باک.) جووتەنی، هاوشان، هەمبەر، هەڤبەر، تەنگال، (باک.) بەردیلک، دوو چتی ڕووبەڕووی یەکتری. ـــ بوون: بەرانبەربوون. ـــ کردن: بەرانبەرکردن.

**بەرامبەرکێ:** بەرانبەری کردن لەگەڵ یەکتری.

**بەرامبەری:** بەرانبەرکێ، زانەوێر، (باک.) بروای تای، وێستانی دوو چت لە ڕاست یەکتریدا. دەست کردنەوە.

**بەرامبەری کردن:** بەرزەبلێس، بەربەرەکانی کردن، بەرگری کردن، بەرهەڵستی کردن، وێستانی یەکێک لە ڕووی یەکێکی تردا.

**بەرانبەری نەکردن:** دانەواندن، بەزین، سەرشۆڕکردن.

**بەرامپیل:** بەرامبەری کردن. بەرهەڵبێنە، کۆڵوانە.

**بەڕان** (باک.): زگ.

**بەران:** شەکە نێری سێساڵییە، خەرت کە گەیشتە سێ ساڵان دەبێتە بەران، هۆگەج، وەرەن، (دەر.) وەران، وەروەن، تیگڵ، قۆچ. ــ خواردن: تەگەگرتن، وەتەگەگرتن، (ئەردە.) مژان.

**بەرانان** : شاخێکە لە باشووری ڕۆژئاوای سلێمانییە.

**بەرانەجەنگێ:** بەرانبازی، قۆچبازی.

**بەرانەک** (باک.): قامکە گەورەی دەستییە.

**بەرانەکێوی:** جوورە بەرانێکی کێوی سوورکاری شاخداری قۆڵ هەڵکراوی تووک کورتە، نێری بزنە کێوییە.

**بەرانبازی:** شەڕەبەران، بەرانەجەنگێ.

**بەرانبەر:** بەرامبەر، بەرابەر، ژهەڤپەر.

**بەرانبەرکێ:** بەرامبەرکێ، کللاییێن، یاری بەرانبەری.

**بەرانبەری:** بەرامبەری.

**بەرانبەری کردن:** بەرامبەری کردن.

**بەرانپۆز:** کەپۆقیت، لووت دەرپەڕیو.

**بەرانپێچ:** جۆرە بەروانکەیێکی گەورەیە ژنان لە کاتی فەرمان بە بەرسنگیانەوە دەگرن.

**بەرانپیل** (هەو.، کۆ.): (هەورا.) ملوانە، کۆڵوانە، بەرهەڵبێنە، بەرانپێچ.

**بەرانکێ:** بەرانکە، (بار.) قامکی گەورەیە، (دەر.) پەنجەکەڵە.

**بەرانگە** (باک.): تەنبەڵ، سست.

**بەرانگە** (باک.): پەچەی مەڕ و بزنانە.

**بەرانی** (باک.): داری بەری.

**بەرانین** (باک.): پێشکەشکردن.

**بەراو:** زەوی و میوەیەکە بەراو بێ، ئاوی، ئاوەنیا، ئاویە، ئاوێژە، پاراو، (باک.) بەراڤ، (هەورا.) دەراو.

**بەراوان:** پارێزگار: کەسێکە یا چەند کەسێکن لەگەمەدا بۆ پارێزگاری لە جێگایەکی تایبەتی دادەنرێن. ــ ی: پارێزگاری، ئارینەک.

**بەڕاوەبەر** (هەورا.): بەڕێوەبەر.

**بەراوەرد:** سەرنج، بەراوورد، جووتەنی. ـــ کردن: بەرهەڤدان، جووتەنی کرن. ــ ی: بەراووردی.

**بەراوەژوو:** ئاوەژوو، بەرواژی، (دەر.) هەڵگەردیاوی.

**بەراوەڵە:** بەروەدە، گوشاد، پێش ئاوەڵە، بەربەرەلا، پێش بەرەلا، بەرگوشاد، فراوان، پێش فراوان.

**بەراوەرد:** بەراوورد.

**بەراوەژوو:** ئاوەژوو.

**بەراوپشت** (ئەردە.): بەروپشت، ئاوەژوو، بەرواژی.

**بەراودان:** پێش ئاوگرتن تا ئاو بۆ ئەو شوێنەی پێویستە بچێ.

**بەراوورد:** بەراوەرد، تاقی.

**بەراووردن:** بەراوەردکردن، تاقی کردنەوە.

**بەراووردکردن:** لێکدانەوە، تاقی کردنەوە.

**بەراووردەی** (هەورا.): دەرهێنان.

**بەراوێتە:** وڵاخێکە بەری ئاوێژتبێ بە ناکامی، بەرهاوێژتوو، بەراوێژتوو، (هەورا.) بەرش ووستن، (ڕۆژ.) بەرەوەن (بۆ ژنانە).

**بەراوێژ:** گیان لە بەرێکە بەرباوێ.

**بەراوێژتن:** بەرهاوێژتن، (باک.) بەراڤێتن.

**بەراوێژتوو:** گیان لەبەرێکە بەری هاوێژتبێ، بەراوێتە، بەرهاوێژتوو، (ڕۆژ.) بەرەوەن (بۆ ژنانە)، بەروەنە.

**بەراوێلکە:** باڵندەیێکە هاوینان زەرد و بەرسینگی ڕەشە پاییزانیش ڕەنگی مەیلەوشین دەبێ، بەرگاییلکە، بەرگاوێلکە.

**بەراهک** (باک.): بەرایی، سەرەتایی.

**بەرێوارە:** بەرئێوارە خۆرەزەرد، دووای نیوەڕۆ.

**بەرایێ:** بەرایی، دەست پێک، لەبەراییدا: پێشان، لەپێشدا.

**بەرایی:** پێشانی، لەپێشدا، سەرانگایی، سەرەتا، (هەورا.) وەڵێنە، بەرایێ، سەر، بەڕاهک، براهک، پێشڕەوی چتێک، باوەڕ، بڕوا، فتوا، برائی، چاوم بەرایی نادا بە نەخۆشی بیبینم.

**بەرایی دان:** چاو هەڵاتن، چاوهەڵهاتن، دڵ بڕوایی دان: چاوم بەرایی نادا وا بە کزی دارای ببینم.

**بەرایی هاتن:** بەرایی دان، دڵ بڕوایی دان، چۆن کوردۆ چاوی بەرایی هات باوکی وا بە نەخۆشی ببینێ.

**بەرە:** بەش، بەرە هەویر، ڕۆن، بەهرە، بەرەمەشکە، بەرووبۆ، دەستکەوت، قازانج، بەهرە، بەرژەوەند، نۆبەرەی کاری خۆت نازانی، (هەورا.) دەرک، دەرکە، دەرگە، دەرگا، بەرۆک، بەرسینگەی ئەسپییە، قایشە باریکەکانە، کە بە بەرسینگی وڵاخاندا تێدەپەڕێنرێ، دەستە، تیرە، بەرەباب، گرۆ، (باک.) کۆمەڵە، بەر، نەتەوە، (هەو.) قەتارە، ڕێزە دێراوێکی دە دووازدە دێراوییە، (سوێ.) گۆیەرۆک، (ئالا.) ئێخیە و بەرۆکی ژنانە، قایشێکی پان و ڕیشوودارە بەبەرسینگی چارەوێدا دێت و زینی پێ قایم دەکرێت، پەلێکی بەناو هەردوو دەستی چارەوێدا ئەڕوا و لەتەنگەی ژێر سکیدا هەڵدەکێشرێ ئەو چارتەنگەیە بە تەنگەهەڵکیش بەزینەوە توند قایم دەکرێ و دەبەسترێ، هیلمەی گۆرەوی. سامان، ساو، هەواخۆشی دووای بارانە. ووتەیێکە جووتیار بەگای جووتی دەڵێ لە کاتێکدا، کە گایەکە پشت هێڵ بێ واتە ڕووی لە بوورە بێ، چتێکی سێ پەلە، پەلێکی بە تەنگەوە و دوو پەلەکەی تری بە قەڵتاغەوە توند دەکرێ، (هەورا.) خۆشی دووای بارانە. (باک.) بلا، با، بۆ فەرمانە.

**بەرە:** ڕایێخێکە لە بەنی خوری چنراو دروست دەکرێ، (باک.) بەرک، (فە.) لەی، (دەر.) ووڕە، (هەورا.) بەڕ، لەی، گلێم، شاڵینە. پێ لە ــ تێپەڕاندن: شوول لێ هەڵکێشان. بەرە لەقوڕدەرخستن: سەرکەوتن، ڕزگاری لە کارو فەرمانانندا. (شو.) بەرخ.

**بەرەباب:** نەتەوەی باب، ڕەچەڵەک، بنەچەکە، تیرە، پشت، (باک.) بابک.

**بەرەبەرە:** کەمکەمە، نەختەنەختە، پیچ پیچە، بەرەوبەر، لەسەرەخۆ، هێدی هێدی، دەستەدەستە.

**بەرەبەیان:** شەوەکی، دەمەدەمی بەیانی.

**بەرەبێڵ** (ئەردە.): بەرەجووت. بەربێڵ.

**بەرەبین** (هەورا.): زاربێن، بەنی زارکی مەشکە و خیگە و کوندە و ئیترە.

**بەرەپاش** (باک.): بەرەوپاش.

**بەرەپۆ** (ئەردە.): بەرە، گلیم.

**بەرەپێش** (باک.): بەرەوپێش.

**بەرەتەشی:** دارێکی خڕی کونداره دەکرێ بە کلکی تەشی لە کاتێکیدا سووک بێ و زۆری لەسەر هەڵنەکرابێ بۆ ئەوەی قورس بێ و باش بسووڕێتەوە.

**بەرەتووتن:** بریتییە لەو گیشە تووتنە لە پاش دەرکردنی مڵکانە لە هەموو تووتن لە کشتیار دەستێنرێ بۆ خاوەند مڵک یا ئاغا.

**بەرەتی** (ئەردە.): بڕێتی لە بابەت، لە جیاتی.

**بەرەجفت:** بەرەجووت.

**بەرەجووت:** (موک.) بەرووبۆ، ڕەوار، بەرەجفت، بەرەجۆ، وەرز. زەوی و زاری جووتی، بەوەندە زەوییەی دەڵێن، کە جووتێر جووتی تێدا دەکات و بەر و بوومی لێ کۆدەکاتەوە، دەغڵ و دانێکیشە، کە ساڵە و ساڵ کشتیار لە زەوی خۆیدا هەڵیدەگرێ. ــ دار: ڕەواردار، پرسوود.

**بەرەجەژنانە:** چەند ڕۆژێکە لە پێش جەژنەدا، کە مرۆ خۆی تێدا ئامادە دەکات بۆ جەژنە.

**بەرەخووار:** بەرەوخووار.

**بەرەخەر** (ئەردە.): شووێنێکی تایبەتییە، کە باری وڵاخی لێ دەخرێ. مێینەیەکیشە، کە بەرباوێ.

**بەرەدا:** ڕووبارێکی ئاودارە لە شامێ، گەلێک زەوی و باغ و باخچەی کوردانی شامی کەوتوونەتە پێش وی.

**بەرەدایی:** ئاوونجی.

**بەرەدەمووکە:** دەموکانە، دەمکانە.

**بەرەدووڤ** (باک.): بەردووک، پێستێکە بە لای بنەوەی دووگی مەڕانەوەیە.

**بەرەدێ:** زەوییەکە، کەوتبێتە نزیک گوندی.

**بەرەڕەت:** ڕەت، (ئەردە.) چاڵێکە داوی تێدادەنێنەوە. داموسک و یا تەپکەیە بنرێتەوە بۆ ڕاوەسوێسکە.

**بەرەزا:** (کۆ.، بابا.) بارێزە، (زرا.) خەزەرۆک، (خۆ.) جوغە، (هەو.) خەزەرە، (ڕەوا.) خاڵەرەش، ڕەبەنۆک، (دەر.) بەرەزە، ڕەبە، گیایەکە لە نێو ئاوێدا شین دەبێ و گەڵای وەهی کەرەوزی دەچێ لاسک و دەمارەکانی باریک و ڕەش و قایمن هەستیاران وە زوڵفی نازدارانی دەچوێنن چونکە، لزگەلزگە بە نێو ئاوێدا پەرێشان دەبێ. دەڵێن کەسێک میزی گیرابێ یا بەردی لەگورچیلکەیدا بێ بە چا بیخواتەوە پرسوودە.

**بەرەزە:** بەرەڵا، ترۆ، وێڵ، سەرگەردان.

**بەرەزەیی:** بەری درکەزیییە لە پانکەی مازوو دەچێ.

**بەرەز:** بەرەزا.

**بەرەزبانە:** (ئەردە.) بەرەزمانە، ئاوزوونەی پشتێند.

**بەرەزووانە** (ئەردە.): ئاوزوونەی پشتێند.

**بەرەزە:** بەرەزا. (ئەردە.) وێڵ و ئاوارە.

**بەرەزەیی:** بەری درکەزی، کە وەکوو پانکەی مازوو وایە.

**بەرەزیی:** بەرەزەیی.

**بەڕەز:** بەڕەزا.

**بەرەزان:** وورده ژانێکی دەمدەمییە لە پێش منداڵ بوونیدا بەچەند ڕۆژێک تووشی ئافرەت دەبێ.

**بەرەزە** (ئەردە.): جەوی.

**بەرەژوور:** بەرەوژوور.

**بەرەژوورە:** بەرەوژوورە.

**بەرەژەنە:** بەرژەنە.

**بەرەژێر:** بەرەوژێر.

**بەرەژێرە:** بەرەوخووار.

**بەرەستە**(بابا.): بەردەستێ.

**بەرەشکۆن:** (موک.) بەرئەشکۆن، بەردێکی گەورەیە، کە کەمێک سەری کێشابێتە پێشەوە و لە ژێریدا سێبەر و جێگای دانیشتن و حاواندنەوە بێ.

**بەرەڤان** (باک.): بەرەوان، نێوبژیکار. ـــ ی (باک.): بەرەوانی، نێوبژیکاری، نێوبژی.

**بەرەک:** بەرۆک، بەروانکەی پزیشک. (ئەردە.) ئەستێرەی سیوەیل.

**بەرەکە** (ڕەوا.): هەوەڵ بەری ترێیەکە دەنک دەنک دەست بە گەیشتن و ڕەشبوونی دەکات.

**بەرەکەبەرەک:** ووتوویژ، پیلەبازی.

**بەرەکەوا:** ئاستەر، ئەستار، (هەورا.) بەتانە، (باک.) بەتان.

**بەرەک و نار:** ژاگە، ژووژەسوورە، شیلان.

**بەرەگە** (ئەردە.): سەرەڕێ.

**بەرەگەڵا:** بەرێکی سووری سپی واشە لە گەڵای دارە مازوو پەیدا دەبێ.

**بەرەڵا:** ئازاد، سەربەست، بەرەزە، گیاندار و ئاژێکە لە ڕۆیشتنێدا بەر هەڵستی نەبێ. ـــ بوون: ئازاد و سەربەست بوون. ـــ کردن: ئازاد و سەربەست کردن، زماندن، خوێڕی، ترۆ، سەرسەری. ـــ کردن: لێ گەڕان، دەڤژێ بەردان.

**بەرەڵابوون:** ئازادبوون.

**بەرەڵاکەردەی** (هەورا.): بەرەڵاکردن.

**بەرەڵاکریاگ:** بەرەڵاکراو، ئازاد.

**بەرەڵایی:** ئازادی، سەربەستی.

**بەرەم** (باک.): ئەمبار، ئەنباری تفەنگێ.

**بەرەمەشکانە:** بەخشینی کەرەی ڕۆژێکییە بە هەژاران لە ڕێی خودادا بۆ ئەوە پیت و فەڕی مەشکەکە زۆربێ.

**بەرەمەشکە:** ئەو بەشە ڕۆنەکەرەیەیە، کە دووای ژاندنی مەشکە دەنێو دۆیەکەیدا گرد و کۆدەبێتەوە بریتییە لە ژەمە کەرەی یەک ڕۆژ.

**بەرەمۆ:** کار و بەرخ و گوێلکێکە بە چەشنێکی وا فێری مژینی دایکی بوویێ، کە بە بەستنەوە نەبێ چاری نەکرێ.

**بەرەموو:** بریتییە لە کار و بەرخ و گوێرەکەیەکی، کە واز لە مژینی دایکیان نەهێنن تا دوور نەخرێتەوە و یا بەلامک یان نەکرێتە دەم.

**بەرەمۆم:** بەرەمێو، تلپەی هەنگوینی.

**بەرەمێو:** خشت و خاڵێکە لە مێوی دەگیرێ.

**بەرەنان:** بەشنان.

**بەرەندەر** (زا.): بەردیل.

**بەرەندیر:** بەردیل، مەڕی دووساڵانەیە.

**بەرەنگ** (ڕەوا.، خۆ.، دەر.): بەرهەنک (دەردێکە). خوورییەکە تازە وەختی بڕینەوەی بێ.

**بەرەنگار:** وەگڕ، ئاوڕیش، دووچار. ـــ بوون: بەرنگاربوون، دووچاربوون، دووچارهاتن، دەگژڕاهاتن، ئاوڕیش بوون. (کە.) ـــ ی: پاڵوو.

**بەرەنیا** (هەورا.): (هەورا.) وەرەنیا، بیراز و چاک کردنەوە.

**بەرەو:** (باک.) ڕوویە، بەربە، بەر، ڕووەو؛ ـــ خۆشی: ڕوو بەخۆشی، ـــ سابلاخێ چوو: ڕوو بەسابلاخێ چوو. بەر، بەدەم، پێش.

**بەرەواژ** (هەورا.): ئاوەژوو، بەرەوازێ.

**بەرەوازێ** (ڕەوا.): ئاوەژوو.

**بەرەوان:** (باک.) بەرەڤان، (هەورا.) ئاوەنی، نێوبژیکار، (هەورا.) دەرکەوان. (دەر.) ـــ ی: ئاشتی، نێوبژی، ناوبژی، (باک.) بەرەڤانی.

**بەرەونێزیاربوونەوە:** بەرەو ڕووبوونەوە.

**بەرەونێزیارکردنەوە:** بەرەو ڕووکردنەوەی دوو کەس بۆ دەرخستنی ڕاستی و درۆی قسەیەک لە نێوانیاندا.

**بەرەوە:** پێشەوە. لە ـــ : لەپێشەوە. مەیدان، ماوە: هێندە بە ـــ نییە. سەرەوژوور، (باک.) بەرێژۆر.

**بەرەوەبوون:** بەربوونەوە.

**بەرەوەن:** بڕوانە: بەرەوان.

**بەرەوبردنەوە:** پێش ڕێی یەکێکی گرتن.

**بەرەوبڕی دنەوە:** پێش ڕێی یەکێکی گرتن.

**بەرەوبوون:** بڵاوبوونەوە، لێژەوبوون.

**بەرەوپاش:** کشانەوە. بۆ پاشەوە.

**بەرەوپیری:** پێشوازی کردنی گەورە و خۆشەویستێک. لە پیری چوونە پێشەوە.

**بەرەوپێش:** چوونە پێشەوە. بۆ پێشەوە.

**بەرەوپێشەوەچوون:** چوونەپێشەوە، پێشڤەچوون.

**بەرەوپێڵ:** بەرانپێچ.

**بەرەوخستن:** پێشخستن.

**بەرەوخۆر:** بەرەوڕۆژ، ڕووبەخۆر.

**بەرەوخووار:** سەرەولێژ، لای خووارووی چت.

**بەرەوخووارکە:** بەرەوخووارە.

**بەرەوخووارکردنەوە:** ناردنی چتێک بۆ بەرە و خووار.

**بەرەوخوواری:** بۆ لای خووارەوە چوون، بەرەوخووارە.

**بەرەودووا:** بەرەوودووا.

**بەرەودووان:** بەرەوودووانان.

**بەرەودووایی:** بەرەوودووایی.

**بەرەوڕوو:** ڕوویەڕوو.

**بەرەوڕووبوونەوە:** کۆبوونەوە بۆ دەرخستنی قسەیەک، کە لە نێوانیاندا کرابێ.

**بەرەوڕووکردنەوە:** ناردنی یەکێک، کە چتێکی لەسەرت بێ بۆلای یەکێکی تر، کە تۆ چتێکت لای بێ بۆ ئەمەی، کە بچێ لێی وەربگرێتەوە، بۆ خۆی بەرە و ئێزبارکردنەوە.

**بەرەوژۆر:** بەرەوژوور، لای سەرەوە، سەربەرەوژوور، (شەم.) بەراژۆ.

**بەرەوڕۆیین:** بەرەوکەفتن، پێشکەوتن.

**بەرەوژۆرتر:** (شەم.) بەراژۆتر، بڵندتر.

**بەرەوژۆرترەوە:** بەرەو بڵنترەوە.

**بەرەوژوور:** بەرەوژۆر، لای ژوورەوە. ـــ بوونـەوە: چوونـەلای ژووروو، چوونەسەر. ـــ کردنەوە: ناردنی گیاندار بۆ لای ژووروو. ـــ ە: هەوراز.

**بەرەوژوورەوە:** بەرەوژۆرەوە.

**بەرەوژوورتر:** بەرەوژۆرتر. ـــ ین: بەرەوژۆرترین.

**بەرەوژووڕۆیین:** سەرکەوتن.

**بەرەوژوورکە:** بەرەوژوورە.

**بەرەوژێر:** بەرەوخوار، سەرەوژێر، بەرووخوار، (باک.) بەربژێر.

**بەرەوژێرە:** بەرەوخوارە.

**بەرەوژێرەوە:** بڕوانە: بەرەوژێرە.

**بەرەوژێرکە:** بەرەوخوارە.

**بەرەوسەری:** بەرەوسەری: بەربژۆرقە.

**بەرەوسەرەوە:** بڕوانە: بەرەوسەر .

**بەرەوگەیشتن:** ڕووەوگەیشتن.

**بەرەولا** (ئەردە.): لابەلا، خووار، کەچ.

**بەرەولێژ:** بەرەوخووار. ـــ ایی: هەڵدێرگە، بەرەوخوواری.

**بەرەولێژە:** سەرەولێژە.

**بەرەولێژکە:** بەرەولێژە.

**بەرەولێژی:** بەرەولێژی.

**بەرەوهەویر:** بەشەهەویر.

**بەرەومال:** ڕوویەماڵ.

**بەرەی کار:** بەرژەوەندی کار.

**بەربا:** کووزەر، کۆزەر، پووش و پەڵاشی دانەوێڵەیە، کە شەن و کەو کرابێ و پاک کرابێتـەوە. (دەر.) باگر، وەروا. بـەرباد، خـراپ. دانەوێڵـەیێکی پووچە، کە لەکاتی شەنەکردنە بابیبات. چتێکە، کە بای لێ بدا باشتر دەردەکەوێ.

**بەربات:** بەرباد.

**بەرباخت:** بەربەخت، کچێکە کاتی شووی هاتبێ.

**بەرباد:** خـراپ، وستۆ، چـتی پـڕوو پـووچ و لـە کارکـەوتوو، توونـا، تەفروتوونا. ـــ بوون: لەناوچوون، پەرێشان بوون.

**بەربادبوون:** تەفروتوونابوون.

**بەربادکردن:** لە ناوبردن و پەرێشانکردن، تەفرو توونا کردن.

**بەربادی:** تەفروتوونایی.

**بەربار:** بەرپرسیار. ـــ بوون: بەرپرسیاربوون، جاشـەکەر یـا ئێستـرێکە تەمەنی سێ ساڵی تەواوبێ، کاتی بـارکردنی هـاتبێ و هێشتـا نـەگیرابێ، ووڵاخێکە تازە فێرە باربردن بکرێت.

**بەرباران** (باک.): چەتر، سەیوان.

**بەرباری:** بەرپرسیاری.

**بەربازن:** بازنـەی گچکە، بازنۆکە، بـازنێکی بـاریکی گچکەیـە لـە دووای بازنەکانی ترەوە لە دەست دەکرێ بۆ ئەوەی دانەماڵرێن.

**بەربانک** (باک.): سەربان، (ئاک.) هەیوانی پێش باڵەخانەیە.

**بـەربانـگ:** خوواردنێکـە، کـە ڕۆژووان لـە ئێوارێـدا بێخـووا، بەرشێو، سەرشێو، ناشتا، بەیانی زۆر زوو، سپێدە، بەرشیو، سەرشیو. ـــ کردنەوە: ناشتاشکاندن، خوواردنی بەربانگ لە ئێوارەدا، (باک.) لوولـە، بۆڕی.

**بەربای گووێ کەوتن:** سووسەکردنی دەنگ و باسێک.

**بەربـەخت:** گـەورەکچ، کچێکە گەیشتبێتە سەردەمی مێردکردن، (باد.) گەرگەمری.

**بەربـەر** (بـاک.): سـەرتاش. چاولێکـەر، ئاگـادار، تاسـب. دەنگێکـە جووتیار پێی لەگای جووتی ڕادەخوڕێ، کـە بیـەوێ گایەکان لابکەنەوە بۆ لای بوورەوە.

**بەربـەرە:** دارێکی چەوتـە دەخرێتـە گێڕی هـەوجاڕ بـۆ تـەختکردنی گـێڕ. بەفرماڵ، وەروەرە.

**بەربـەرەکانی:** بەربـەرەکانێ، حەمـەرەمزێ، سـەرهڵاتین، بەرانبـەری، ڕقەبەری، ڕکەبەری، ملە، مل ملانێ، (ڕۆژ.) پالوو، پیلە، مشت و مڕ، زانەوێر، مل ملانە، داروگیر، برواێتای، چەنە بە چەنـە وێستانی یـەکێک لـەگـەڵ یـەکێکی تـردا، شیپووڕان. ـــ کـردن: قـەپڕلاندن، هەمانـە، سەرهڵاتین، سەربڵندکردن.

**بەربـەرەلا:** بەرناوەڵـە، بـەروەدە، گوشـاد، پێـش ناوەڵـە، پێـش بـەرەلا، فراوان، پێش گوشاد. ـــ یی: فراوانی، پێش گوشادی.

**بەربەروو** (پیرا.): بەربەخە، بەرئێخە. ـــ یی: بەرئێخەیی.

**بەربەرۆچکە:** (دەر.) بەروەرۆژ، (هـەورا.) بەربـەرۆژ، (سوور.) بـەرڕۆژ، بەربەرۆژک، شووێنی پەنابای ڕوویەهەتاوە.

**بەربەرۆژ** (هەورا.): بەربەرۆچکە.

**بەربەرۆژک** (باک.): بەربەرۆچکە.

**بەربەرۆشک** (زا.): مـەردومی بێ ئیش وکـار. کەسێکە هەمیشـە لـە مویەقدا بێ.

**بەربەری:** چاولێ کەری.

**بەربەزە** (باک.): گرتن و تالانکردنی ماڵی دوژمنان.

**بەرەژن:** نشتوو، (دزە) بەربەند، نوشتە، حەمایەل.

**بەربەس:** بەربەست، بەربەند، بەرپێچ.

**بەربەست:** بەرهەڵست، قەدەخە، بەرهەڵستێکە لە پێش ناو یا لەسەر ڕێگا دادەنرێ بۆ نەڕۆیین و هاتو چۆنەکردن. ـــ کردن: بەرهەڵست دانان، پێشگرتن.

**بەربەسکردن:** بەربەستکردن، هەڵکێشانی پیسی ڕەنگ کراوە لـە زاخاوی گەرمدا تا ڕەنگەکەی نەچێتەوە.

**بەربەسێڵ:** سیرماست، قەلیسێڵ، گۆشتاوی بە ماست، چێشتێکە بەرخێکی لە نێوسێڵیدا سوور دەکەنەوە دوایە ماستی تێدەکەن و کەمێک دەکوڵێ و هێندێک ڕۆنی کەرمشی بەسەردادەکەن.

**بەربەش** (باک.): ماکانی کانی نە پاڵێوراو. (زا.) چتێکە لە کان دروستکرابێ.

**بەربەق:** بەربەستێکە لە مەرەزەی (تیر) دا لە زەوییەکیدا دروستدەکرێ، کە بەرز و نزم بێ بۆ ئاو خواردنەوەی مەرەزەکە بە یەکسانی.

**بەربەن** (ئەردە.): بەربەست، بەرپان، بەرپێچ، بەرگیل، بەنگە. چێوهێل، چێوکێش، بەرەن.

**بەربەن:** جوورەخورمایەکە.

**بەربەنە** (ڕەوا.): ژێرچەنە، (هەورا.) چێرچەناگە، (ڕەوا.) قەمچوولە، (دزە.) لوولەی نشتوو یا حەمایەڵە و یا ڕشتەی مووروو باشی ژنانە، کە بەلاتەنیشتێدا لە ملی دەکەن، بەربەژن، (باد.) سیخمەی ئافرەتانە.

**بەربەیار** (موک.): زەوییەکە بەبێ شێوکردنەوەی بچێنرێ، (موک.) بەروبوو.

**بەربچاف** (باک.): ماڵبات دانەر، ئەوکەسەیە ڕادەی مافی ئاغا یا دەوڵەت لە ماڵی کاسب و ڕەنجبەران دیاری بکات.

**بەربچان** (زا.): کەسێکە ڕەووشت و خووی لە خەڵک بەدەربێ.

**بەربخووار** (باک.): بەرەوخووارەوە. ــ یێ (باک.): بەرەوخوواریێ.

**بەربڕ** (باک.): بەردشکێن. پێشگر، ئەو کەسەیە ڕێگای بەدوژمن بگرێ. ــ ی: بەردشکێنی، پێشگری.

**بەربڕینەوە:** پێشگرتن، بەرهەڵستکردن، پەک خستن، نەهێشتن.

**بەربزار:** ناویزە، بژاردە، سەرگوڵ، سەردەستە. ــ ی: نازیاری، نیماد.

**بەربژۆر:** بەرەوژوور، سەرەوژوور. ــ ی: بەرەوژووری.

**بەربژێر:** سەرەوژێر، بەرەوخووار. ــ ی: سەرەوژێری، بەرەوخوواری.

**بەربشەپ** (باک.): دەراوی چۆم و دەریایان.

**بەربڵاو:** پێش ئاوەڵە، پان، فراوان. ــ ی: پێش ئاوەڵەیی، پانی، فراوانی.

**بەربن** (ئەردە.): بەربەست.

**بەربوو** (زا.): ئەوکەسانەن، کە بۆ بووک گوواستنەوە دەچن.

**بەربووار:** بڕوانە: بەربووارد.

**بەربووارد** (هەورا.): قسر، ئەستێوور، ئاژاڵێکە یا ماڵاتێکە نۆبە بەری خۆی بگۆڕێ واتا ئەوساڵەی، کە پێویستە بەربگرێ نەیگرێ و بیبوورێ.

**بەربووری** (باک.): سیخمە. (باد.) بەربووک.

**بەربوورە:** تۆوچاندنە بە زەویدا پێش ئەوەی، کە بکێڵرێت، بەرچێن، پێش بینین و چاو پێکەوتن: تۆلە ــ بڕیارمەدە واتا تاچت بە چاو نەبینی باوەڕ مەکە و بڕیاری لەسەر مەدە.

**بەربووز** (بار.): چۆخە، چۆغە.

**بەربۆسە:** (ڕۆژ.) بەلەوچکە، مرازێکە لە کەرستەی جووتیدا.

**بەربووق** (زا.): گونجی ئاو.

**بەربووک:** (باک.) پۆڕسپی، (ڕۆژ.) پاخسوو، پێخەسوو، ژنێکە لەگەڵ بووکێ دەچێتە ماڵی زاوای، کە لە پەردەی هاتنەدەرێ دەگەڕێتەوە، ماڵی بووکی، سەرچەرمی. ــ ی: پیشەوکردەوەی بەربووک.

**بەربوون:** ئازادبوونی بەندی و گرتووان. بەرەڵابوونی بێستان و باخ و باخچە. بەرەڵابوونی وڵاخ و ئاژاڵی بەستراوەوە و یا باڵندە لە قەفەزێدا. ڕایی بوونی ئاو. ــ ی مانگ و ڕۆژ: لە گیران دەرچوواندن. ترازانی دوو چتی لێک قایمکراو. تەختەی ئەم کورسییە یا ئەم دروومانە بەربووە. ــ خوواردن: دەست بە خوواردن کردن.

**بەربوونەوە:** کەوتن، کەرتنەخووار، کەتن، کەفتن، وەرۆبین، تەکەربوون، کووربوونەوە، وەردەوەبین. ڕمان، تەپین، ڕووخان. مرۆڤ، وڵاخ، یا چتێکە دووبارە بەرەڵاو ئازاد بێتەوە. کەوتنەخووارەوە، ڕایی بوونی ئاو.

**بەربەهڤ** (باک.): وێچوو، بەرانبەر. ــ بوون. ــ کرن. ــ ئانین. ــ هاتن،

**بەربێژ:** سەرەتا، دەست پێکی، دیباچە. (زا.) چەنەباز، چەنەدرێژ. ــ ی: چەنەبازی.

**بەربیست:** سەرەتای لاوی.

**بەربێڵ:** بەرەجووت، دەسترەنج. چەند کەسێک بە هاوکاری مەرەزەیێک بکەن، هەر یەکێک لەوان بەربێڵێکیان هەیە واتا بەشێکیان هەیە.

**بەربێن:** بەن کەڵەوە، بەندکەڵەمە. *

**بەربین** (بابا.): بیناقاقە، بنسەر، بن چەنەگە، تینتینۆکە، قوڕقوڕاگە لە دیوی دەرەوە.

**بەربێندە:** ئەو بەنەیە، کە کەڵەوەی لەملی گایان قایم دەکات.

**بەرپا:** ڕوودان، گڕبوون، گڕگڕین، قەومان. ــ بوون: هەڵگیرسانی هەراوئاژاوە. ــ کردن: گڕکردن، گڕگڕاندن، دابنارتن، هەڵگیرساندنی هەراوئاژاوە. هەڵستاو، هەڵساگ، سەرپا. ــ بوون: هەڵسان، بەرزبوونەوە، ڕوودان. ــ کردن: هەڵساندن. هەڵاییساندن.

**بەرپاش** (زا.): پێچەوانە.

**بەرپاڵ:** ڕێگایەکە بەرەو هەورازبێ، بەرەو بەرقەدی چیاو گردوملان.

**بەرپەچدانەوە:** قسە بردنە دووارەی یەکێک بەقسە هێنانەوە بەسەری دا. بەرەوپری دانەوە لەمڕۆینا. بەرپەرچدانەوە.

**بەرپەرچ:** وەڵام. (ئەردە.) پەرژین. بەهانە، بیانوو، بیانک.

**بەرپەرچدانەوە:** وەڵام دانەوە. بەهانەهێنانەوە.

**بەرپرسیار:** (موک.) بەرپار، پێناودار. کەسێکە لە بەرانبەر چتێکەوە بەرپرابێ وپرسیاری لەسەربکرێ. ــ ی: (موک.) بەرپاری، پێناوداری.

**بەرپشت** (باک.): کورتانی پشتی کوڵ هەڵگر.

**بەرپۆز** (ڕۆژ.): بەرانبەرگرتن. لەبەرانبەردانیشتن.

**بەرپێچ:** سەموون، پارچە ئاسنێکی وەکوو مووروو وایە لەسەر بورغییان توند دەکرێ تا بورغییەکە خاونەبێتەوە و دەرنەیەت. بەربەست، پێشگیری، بەرهەڵست.

**بەرپێن:** پێوبەربێ، پێوبەرپێی کەسێکی دان لەمزۆرانێ و ئیتردا بۆ خستن.

**بەرپێنە** (سوور.): پەرپینە، پرپرە. (هەورا.) پەڵپێنە.

**بەرتا:** گەندەتا، تایەکە لەپێش نۆبەتیدا بە سووکی سەرهەڵدەدا.

**بەرتاش** (باد.): بەردتاش.

**بەرتاشت** (بۆتا.): بەردلک، بەرچا، نانی سەرلەبەیانی.

**بەرتاو**: بەرهەتاو، بەرخۆر. بەربەرۆچکە.

**بەرتەر** (کەل.، زەن.): پێشتر، پێشووتر، بەرووتر.

**بەرتەرەف**: چتێکە لەکەڵک کەوتبێ.

**بەرتەسک**: بەرتەنگ.

**بەرتەشت** (باک.): بەرچا.

**بەرتەق**: بارتەقا، بەقەد، هێندە، هەند.

**بەرتەلانە**: بەرتێلانە.

**بەرتەوبۆڵە**: پرتەوبۆڵە.

**بەرتر**: پێشتر. ـــ ین: پێشترین.

**بەرتل** (ئەردە.): پارە یامیچێکە لەیاری. (مووشێن) لەبەرتیلی هەڵمەتدا دادەنرێ.

**بەرتێشت**: (بۆتا.) بەرتاشت. (باک.) بەرتەشت.بەرچا، بەرقەلیان، بەرچایی هەوەڵ خواردنی یەکەمینی بەیانیانە.

**بەرتیل**: وەڵیقەت، ژێرزووان، زووان گوشادانە. (هەورا.) چتێکە بیدەی بەیەکێکی، کە کارێکت پێی بێ بۆ ئەمەی ئەوکارەت بۆبکات. (باک.) کاسەوباەی مەیە. ـــ کرن: تێکدان، کاورل وخراپ کردن.

**بەرتێڵ**: بروانە: بەرتیل.

**بەرتیلخۆر**: (هەورا.) وەڵیقەخوەر.

**بەرتێلانە** (ئەردە.): دیارییەکە لەماڵی زاواوە دەنێردرێ بۆماڵی بووک لەپێش گوێزتنەوەیدا.

**بەرتیلخواردن**: بەرتیل وەرگرتن.

**بەرتیل کردن** (ئەردە.): ڤەکێشانەوە لەیەکێک.

**بەرج**: خەرجی خۆرانیی.

**بەرجا**: بێجگە، بێ لە، جگە.

**بەرجەوەن** (ئەردە.): بەرچاو، دیمەن.

**بەرجەوەنگ**: بەرژەوەند.

**بەرجەوەنگ کردن**: بەرژەوەندکردن، لێکدانەوە، بەراوردکردنی، چاکەوخراپەی قسە. تا قسە لێک نەدەیەوە مەیکە.

**بەرجفت** (ئەردە.): بەرەجووت.

**بەرجل** (باک.): بەرچاوتەنگ. بەروانکە.

**بەرجلی** (باک.): بەرچاوتەنگی.

**بەرجێنک** (زا.): بەرچاوکەی ژنان.

**بەرچا**: بەرقەنە، بەرقەلێک، بەرچایی، سەرتیشت. (بۆتا.) بەرتاشت. (باک.) بەرتەشت، بەرتێشت، بەردلک، بەردل، ناشتا، یەکەمین خواردنی بەراییە لەبەیانیاندا.

بەرچاڤک

**بەرچاڤک** (باک.): چاویلکە.

**بەرچاو**: پێشچاو، تەماشاگە، چاوەنداز، دیمەن، پێشگە، پێشگا، (ڕۆژ.) توویزم. بەرچاوکە. چتێکە هەمیشە لەبەرچاوبێ.

**بەرچاوە**: بەرچاوکەی وولاخان.

**بەرچاوتاریک**: پێشچاوتاریک. توورە. ـــ بوون: پێش چاوتاریک بوون. مەبەس لەتوورە بوون ورق هەستانە.

**بەرچاوتەنگ**: لەچەر، ڕژد، نەخۆر، چەپخووس، ڕووژد، (بابا.) چرووک، (باک.) بەرجل، چکۆس، گزاف، (باک.) کوند، کنووس، چاڤتەنگ. دەزگرتی، دەستگرتی، قرنسووس، درژ، گیر، ماسک، دراڤگەنی، نەگریس. ـــ بوون: ڕژدبوون، چاوپێ هەڵنەهاتن. ـــ ی: کوندی، بەرجلی، ڕژدی، ڕووژدی، لەچەری، قرنووسی، کنووسی، چرووکی.

**بەرچاوتێر**: مرۆڤی دڵفراوان. ـــ ی: دڵفراوانی.

**بەرچاوکە** (باد.، کۆ.): دەستەچیلە. (موک.) بەرچاوکەی وولاخان، پێشچاوکە.

**بەرچاوگە**: دیمەن، بەرچاو. پارچە خشڵێک یاچەند زەنگیانەیە و موورووییەکی هۆنراوەوەیە ژنان بۆجوانی بە پێش سەریانی دادەکەن. ئەو قەیتانە ڕیشوودارەیە، کە بەناو چاوانی وولاخدا دەکرێت بۆ دوور خستنەوەی مێش.

**بەرچایی**: بەرچا، بەرقەنە، خواردنێکە بەیانیان بە چاوە دەخورێ.

**بەرچەپ**: مێمل، چەل مەل، ملۆزم: دارا ـــ ی فەرەیدونییە.

**بەرچەق** (باک.): دەسکی شیر و خەنجەری.

**بەرچەنگ**: بەردەست.

**بەرچچاک**: بەرچنۆک.

**بەرچلک** (باک.): چیکڵدانەی باڵندانە.

**بەرچن** (خۆ.): پارچە بووزوویێکە لەڕاستی زێی بزناندا دەدروێ بۆئەوەی تەگە نەخووات.

**بەرچنە** (خۆ.، باڵە.): سەوەتەی شوولی قووڵی لاپانە میوەی تێدا دەبرێ بۆ دوور.

**بەرچنۆکە**: سەوەتەی گچکە.

**بەرچۆ**: فەرمان وکردارێکی ڕسکاوی ئەوتۆیە، کە کەسێکی تر نەتوانێ بیکات.

**بەرچووڤ** (باک.): بەرچووق.

**بەرچووق**: بەرچووڤ.

**بەرچیت** (باک.): پەردە، تیغە، پەردەییێکە بۆهەوا بگیرێتەوە. تیغەیێکە لەقامیش لەنێوخێوەت وچادراندا بۆجووێ کردنەوەی جێگای پیاو و ژنان. بەرچیغ.

**بەرچیچک** (زەر.): نزگەرە، (هەو.) بەرچیچکە.

**بەرچیخ**: بەرچیغ.

**بەرچیغ**: (هەو.) قیسپ، (هەورا.) خێزەرە، کێزمە، ڕکە، ڕکەمە، ڤرک. وورک، تێلا. سینگێکی درێژە لەسەریان یاسەرزەوی دادەکوترێ چیغی پێ قایم دەکرێ، تا نەکەوێت.

**بەرچێلە** (هەو.): تێخە.

**بەرچێلک** (با.): چیکڵدانە.

**بەرچێن**: زەوییەکە خەرتە نەکرابێ تەنها تۆوی تێدا چێنرابێ و کێڵرابێ، بەربوورە.

**بەرچینە**: بەرچنە، سەوەتە.

**بەرچینەک**(زا.): چیکڵدانەی باڵندانە.

**بەرچینۆک** (باک.): سیقەتۆرە و چیکڵدانەی باڵندەی گۆشتخۆر.

**بەرخ**: (دەر.، فە.)وەرک، (هەورا.) وەرە، (باک.) ئەملکن، بێچووی مەڕانە چ نێر بێ چ مێ تا تەمەنی دەگاتە (٥، ٦) مانگی و هەتا بەرگنەکەی دەبڕێتەوە هەر پێی دەڵێن بەرخ.

**بەرخ ئاهوو**: کارمامز.

**بەرخەبەبە**: زنخدان، بەبەغە، چۆلەمە، گۆشتە گردەکەی ژێر چەنەگەیە.

**بەرخەبەبەدار**: (بابا.) بەرکوور.

**بەرخەبەران** (کە.): کاوورەبەران.

**بەرخەگەل**: بەرخەل.

**بەرخەل**: بەرخەگەل، بەرغەل.

**بەرخەلەوان**: بەرخەوان.

**بەرخەمێ**: (ڕۆژ.) وەرەما.

**بەرخەنجەر** (ڕەوا.): (بارزا.) پاشخەنجەر، کێردی بەرخەنجەرێ.

**بەرخەنێر**: (ڕۆژ.) وەرەنێر.

**بەرخەوان**: وەرەوان، بێچووەوان، (باک.) بێچڤان، (باد.) بەرخەڤان، (هەورا.) وەرەوان، ساوەلەوان. ـــ ی: وەرەوانی.

**بەرخدان**: دەولیباز (یزدان) ی مەڕییە.

**بەرخستن** (ڕۆژ.): بەرهاویژتن. منداڵ یا بێچوو بە مردوویی فڕێدان. بەراویژتن. خستنە پێش، پێشخستن.

**بەرخۆ** (باک.): ناوی ئافرەتانە.

**بەرخووار** (باک.): بەهەوا، بەفیز، گومڕا. خواردەمەنیەکی کەمە کە جووێ کرابێتەوە لە ئازووخەیێکی زۆر بۆ ئەمەی، کە بۆ خواردن لەبەر دەستدابێت. چتی خوار و خێچ.

**بەرخوواردن**: بەرهەم خواردن، بارخواردن. تووشهاتن، گرفتاربوون. تێگەیین، تێگەیشتن. شکانەوە.

**بەرخووەدار** (باک.): بەرخوردار، پایەدار.

**بەرخووەدان** (باد.): تەماشاکردن.

**بەرخووەر** (باک.): کەڵک، سوود، بەر، بەرهەم.

**بەرخۆر**: بەرتاو، بەرهەتاو، بەربەرۆچکە. بەرهەمخۆر. کەسێکە بە مێچکەمێچکە و قسەی خۆش خۆی باتە پێشەوە بۆ ئەوەی، کە بەرووبوومی خەڵکی بخووات.

**بەرخوردار**: پایەدار، تەمەندرێژ، سەربڵند. ـــ بوون: پایەداربوون، بەری ژیان خواردن. ـــ ی: پایەداری، تەمەندرێژی.

**بەرخوردکردن**: پێکەیین، تووشبوون.

**بەرخوورک** (باک.): شڵێوە، بارانە و بەفر پێکەوە. بەرزەی گچکە.

**بەرخۆڵە**: گیابەرخۆڵە. بەرخی ساوا و گچکە.

**بەرخی ساوا**: (باک.) ئەملک.

**بەرد**: (هەورا.) تەوەنی، (زەن.) کەمەر، (ڕۆژ.) کەمەر، پەل، (باک.) بەر، کەوور، کەڤر. (دەر.، ئەردە.) کوچک، کووچ، سەنگ. لە ـــ دان: بەبادادان، دەست بڵاوی، چواندن، لەنێوبردن. پڵلار، تەوروس، تانە، تانووت. ـــ پێدادان: بەردهاویژتن، پڵلار ئاویژتن، تەوروس تێگرتن. (باک.) لوولەی چکۆلە.

**بەردا**: لەبەرا، لەپێشدا، هەوەڵ.

**بەردەرخ**: کاسە، پیاڵە، بادە، پەیانە، ئاوەخۆرە، (باک.) پینف.

**بەردار**: پڕبەر، خاوەندبەر، پڕسوود. ـــ بوون: بەرهەمداربوون. ـــ کردن: (باک.) بەلیاندن. هەڵگرتن، خودابەردارنیە: خوداهەڵی ناگرێ. باردار، زگپڕ، تۆلدار. ـــ ی: پڕبەری، خاوەندبەری.

**بەرداس** (ڕۆژ.، هەو.): دەغڵێکە کاتی دروێنەی بێ و گەیشتبێ و ئامادەی دروێنەکردن بێ، دەغڵێکە هێندە بەرزبووبێتەوە داسی بکاتێ.

**بەرداسیاو**: بەرداش.

**بەرداش**: بەرداسیاو، (باک.) بەراڤ، تلت. (هەورا.) هارەئاساو، هارە، هاراسیاو. بەردێکی پان و خڕە کونێکی لە ناوەڕاستیدایە بە دووبەرداشان بە هێزی ئاو دەغل و دانی دەهاڕن.

**بەرداشت**: گونجان.

**بەردان**: کۆی بەردە. بەڕەڵاو ئازادکردن، وازلێ هێنان، لێگەڕان. بای دەنگدارو بێ دەنگ بەڕەڵاکردن. ترازان، ترازاندن. هەڵوەشاندن، هەڵوەشاندنەوە. بەرویەرهەم دان. دانەبەر، خستنەپێش، ئاژۆتن.

**بەردانەوە**: دادانەوە، شۆڕکردنەوە، لە حەواوە خستنەخووارەوە، کوورکردنەوە، فڕێدانی چتێک لەبەرزییەوە، تەکەرکردنەوە. بەردانی ئاوی گیراو.

**بەردانی**: بەردەلان.

**بەردەوەتی** (باک.): گۆرانی داوەتییە.

**بەردەوی**: بەردەلان، بەردانی.

**بەردەوێژ**: ماودای هاویژتنی بەردێکی دەستییە، بۆ وێنە ماڵی وان بەرداوێژێک دوورە لە ماڵی ئێوە.

**بەردیی**: بەردانی.

**بەردە**: بەندەی ژێر کڕی چ نێر، چ مێ. وازبێنە، وێڵکە، لێگەڕێ. تالان؛ چ بکرەوبەردەیەکە!.

**بەردەئازەبە**: بەردە عازەبە.

**بەردە ئەستێ**: جوورە بەردێکی شینکارە بە لێدانی ئەستێ ئاگر دێنی.

**بەردە ئەموستیلە**: نقێم، قاشی ئەنگوستیلە.

**بەردەبار** (باک.): داهێنەر، ئاگادار، ئەندازەگر، ئەندازە ناس، ئەندازیار، (زا.) پیاوی ژیر کەسەری لە هەموو چتێک دەرچێ.

**بەردەباران**: کوچک باران، سەنگسار، سەنگباران، بەردفڕێدان، بە زۆری بۆ یەکێک یا یەکێک بە بەردان کوژتن و کۆمایەک بەرد لەسەر گۆڕەکەی کۆکردنەوە. ـــ کردن: بەبەردان داگرتن.

**بەردەباری** (زا.): ڕێئۆنی، (باک.) ئاگاداری، ئەندازەگری، ئەندازەناسی.

**بەردەباز**: بەردێکە لە نێو ئاوێدا سەری لە دەرەوەبێ بەسەریدا باز دەدەن و دەپەڕنەوە، پردەباز، بهۆز.

**بەردەبیرۆ**: بەردێکی زۆر سەختە، شلەمەنییەکی، کە زۆر توند بووبێتەوە وەوی دەچووێنن دۆشاوەکە ئەوەندە خەست بۆتەوە بۆتە بەردەبیرۆ.

**بەردەبێڵ**: مەڕی سێ ساڵانەیە.

**بەردەپان:** تاتی نوێژی، (دەر.) تێت، (هەورا.) بەردەفا.

**بەردەپێ:** (باک.) ئەلپەشک، جۆرە بەردێکی زوور و سووکە لەگەرماوێدا چڵکی بنی پێ و پانیەی پێ خاوێن دەکرێتەوە.

**بەردەترویلکە:** (هەورا.) وورشە، (باک.) پەپەرک، پەپرک.

**بەردەتووتن:** شیشێک تووتنە لە هەموو (کەلارێک) دەردەکرێ بۆ ئاغا لە پاش سێیەکی.

**بەردەچەخماخ:** بەردێکی سەخت و سپییە وە سەدەفی دەچی، کە چەخماخی لێ بدرێ پریشکی ئاووری لێ هەڵدەبێ.

**بەردەحەلانە:** جۆرە بەردێکە لە کوێستانێ هەیە.

**بەردەر:** ئازاد و ڕزگارکار، بەرەڵاکار، (باک.) ئاشکرا، دیار، پەرت.

**بەردەخاڵدار:** بەردێکی خاڵدارە.

**بەردەخووێ:** بەردی خوێ.

**بەردەداخدار:** بەردێکی دیغدێغە.

**بەردەڕژاک:** بەردەمردە.

**بەردەرگا:** پێشدەرگا، بەردەرگانە.

**بەردەرگانە:** ئاستانە، بێلایی، بڵندین، پێشدەرگانە، بەردەرگا. پارەیەکە لە بەردەرگای ماڵی بووک لە زاوا وەردەگیرێ تا دەرگایەکەی لێ بکەنەوە.

**بەردەسلو:** هەسان.

**بەردەروازە:** بەردەرگا، پێشدەرگانە.

**بەردەڕێژ:** ساچمەڕێژ، ڕەقف. ـ کردن: ساچمەڕێژکردن، ڕەقف کرن.

**بەردەڕێژە** (هەورا.): جۆرە بەردێکی سپییە وەکوو شەکری دانارداناره.

**بەردەزوورە:** (زەن.) کەورە زبرە، بەردێکی زبرە چەقۆی پێ تیژدەکەن، بەردەزوورگ.

**بەردەزوورگ:** بەردەزوورە.

**بەردەس:** بەرێکە لە دیوی ژوورەوە بە سەر قۆڵی کەوا و سەڵتەدا دەگیرێ. ژێر دەست، بندەست، ئامادە، دەست و پێوەند، نۆکەری بەردەستان، پێشکار، بەرچەنگ. چتێکی سووکەڵەیە لەبەر دەستان دادەنرێ بۆ فەرمانی هەمیشەیی. ـ بوون: هاتنە ژێر دەست، ئامادەبوون. ـ کردن: هێنانە ژێردەست، ئامادەکردن.

**بەردەستە:** ژێردەست، بندەست. بەردەستێ، بەردی چەخماخی، پارچەیێکە لە دیوی ژوورەوە لەسەر دەستی کەوا و سیخمە دەدرێ.

**بەردەستک** (باک.): مرازێکی کەرستەی جووتییە.

**بەردەستێ:** بەردی ئەستێ، بەردێکە پووشووی لەسەر دادەنێن و بە ئەستێ لێی دەدەن پووشووەکە هەڵدەبێ، (باک.) کەڤرازێر، (باک.) شاگرد، نۆکەر.

**بەردەستی:** ژێردەستی، پێشکاری، نۆکەری. ـ کردن: کارکردن لەبەر دەستی کەسێکیدا، هەڵسووڕان لە ژێردەستی یەکێکیدا.

**بەردەسووری:** تیرەیێکی کوردانە لە کوردستانی ئێرانێدا.

**بەردەشاخ** (کۆ): بەردەمردە.

**بەردەشان:** دێیەکە لە نێوانی مەرگە (سەرسیان) یدایە و لەژێر فەرمانڕەوایی قەڵادزێ دایە، گوندێکە، کە شایەری ناودار عەلی بەردەشانی لەوێ لە دایک بووە.

**بەردەشۆر:** بەچەشنێک دانە ڕێڵە بشووردرێتەوە، کە زیخ و ووردەبەردی لێ بگیرێ. ـ کردن: شووشتنەوەی برنج و نیسک و ماش و ئیتر بە چەشنێکی وا، کە بەردەکەی لێ بگیرێ.

**بەردەعازەبە:** بەردێکی قورسە، کوڕانی هەرزەکار بە بەرزکردنەوەی وی هێزی خۆیان تاقی دەکەنەوە.

**بەردەفکر:** قەلیاندار.

**بەردەڤ** (باک.): بەردەڤک، دەمڕاست.

**بەردەڤک** (باک.): یاوەر، هاوڕاز، هاودەم، هاواڵە. ئامۆژگار. (باک.) مۆدنە، دارجغارە.

**بەردەق** (هەو.): هەراوهووریا، دەمەقاڵە، شەڕوکێشە بە زمان. ـ ڕێخستن: شەڕوکێشە پێ فرۆشتن.

**بەردەقانی** (هەورا.): قۆچەقانی، قەڵماسک، چتێکە بە قەدەر ناو لەپی دەستی لەبەن دەچنرێ دووشیپە لاسکی پێوەیە بەردی پێ دەهاوێژرێ بۆ دەرکردنی گورگ و چەقەڵ و بەراز لە لایەن شوان و پاسەوانەوە یا پاسە چۆلەکەی پێدەکەن لەسەر مەرەزە لە جیاتی چەک.

**بەردەقسڵ:** (ڕەوا.) سەمەبەرد، (هەورا.) تەوەنی ئاهەک.

**بەردەکوڕە** (ڕەوا.): باڵندەیێکە، گۆریە چنە.

**بەردەکوورە:** گووراسن، بەردی کوورەی.

**بەردەگڕوو:** بەردەگڕوێ.

**بەردەگڕوێ:** بەردەگڕوو.

**بەردەگێچ:** بەردی تایبەتی، کە دەسووتێنن دەبێتە گێچ.

**بەردەڵان:** (دەر.) هەردە، بەردەڵێن. زبران، گەرگەر، چەقەڵ، چقڵ، کەرە، کڕێن، شووێنێکە بەردی زۆربێ.

**بەردەڵانی:** زۆر بوونی بەردە لە شووێنێکیدا.

**بەردەڵبەرد:** دەربەدەری، سەرگەردانی، بەشێوەیەک، کە هەردەمەی لە جێگایەک و هەر ڕۆژەی بە شاخێکەوە بێ.

**بەردەڵێن** (درە.): بەردەڵان.

**بەردەم:** پێشدەم، پێشەوە، بەر، پێشدەمی چت.

**بەردەماش:** ئامرازێکی کەژمێرییە.

**بەردەمەڕمەڕ:** خارا، مەڕمەڕ.

**بەردەمردە:** بەردێکی نەرمە مۆدنە و چتی تری لێ دروستدەکرێ، (هەورا.) تەوەنەڕژێ. جۆرە بەردێکی ڕزیویشە تەلاش لێک دەبێتەوە، (کۆ.) بەردەشاخ، بەردەرژاک.

**بەردەمۆرە** (کە.): مۆرە، چتێکی بچکۆلانەی خڕ و یا چووار سووچی تەنکە لە قوڕی کەربەلا و نەجەف دروستدەکرێ شیعان لە نوێژێدا نێوچاوانی لەسەر دادەنێن.

**بەردەمینا:** بەردی مینا.

**بەردەنک:** بەردووک.

**بەردەنما:** تاتی نوێژێ.

**بەردەنوێژ:** بەردێکی پان و تەختی درێژە و نوێژی لەسەر دەکرێ.

**بەردەواز:** بەردەباز.

**بەردەهاڕ:** بەرداش.

**بەردەهەسان:** (کە.) هەسان، هەستان.

**بەردەی** (هەورا.): بردن.

**بەردبار** (باک.): بەخش، بڵاو. ــ کردن: پەخش و بڵاوکردن.

**بەردبەردانێ:** بازەڵێن، جوورە گەمەیێکی منداڵانەیە.

**بەردتاش:** کەڤرتاش. ــ ی: کەڤرتاشی.

**بەردڕ:** ئەو جلک یا چتمەکانەیە، کە لە پێشدا بۆ دڕانێ بەکاربرێت.

**بەردشکێن:** بەردبڕ.

**بەردکێش:** ئەو کەسەیە بەرد دەکێشێت. شەڵتە، بارێکە دوو تای دارە و بەرد و گڵی پێ دەکێشن. *

**بەردگەرمانێ** (هەو.): جوورە گەمەیێکی منداڵانەیە.

**بەردل:** بەردڵ.

**بەردڵ:** خۆشەویست، دڵگر، کەوتنەبەردڵان، چوونە نێودڵانەوە. بەرقەلیان، بەرچا. ــ خستن: بەرچاخواردن.

**بەردلک** (باک.): بەرسینگە، بەرۆک، بەردلکی منداڵان.

**بەردونک:** بەردووک.

**بەردوو** (باک.): بەردوونک، (باک.) بەردووف. ئەو گۆشتەیە، کە نزیکی دونگییە.

**بەردوونەستێ:** ئەستێ و بەرد.

**بەردووخ:** دارێکی ڕاستە لە دووخ ڕستندا بە کاردەبرێ.

**بەردووک:** (هەو.) بەردوونک، (باک.) بەردووف، ئەو پێستە تەنکەیە، کە بەلای بنەوەی دووگییەوەیە و بێ مووە.

**بەردووڵانێ** (باک.): گۆرانییێکە ژنان لە کاتی تەشی ڕستن و خەرەکێ دەیڵێن.

**بەردووڵە:** دووڵە، تەبەک.

**بەردۆش** (باک.): هەژاندن.

**بەردۆڵە:** تەشت، سووێنەی نان تێخستن.

**بەردۆڵیان:** ئەو شووێنەیە لە ئاشدا، کە کاتێ ئارد لەدەم بەرداش جووێ دەبێتەوە دەڕژێتە ناوی.

**بەردی** (باک.): جوورەدارێکە.

**بەردی تروسکەدار:** بەردێکە بتروسکێتەوە.

**بەردی جەهەننەم:** ماتە.

**بەردی چەخماخێ:** کەڤر ئەژیر.

**بەردی ڕەژی:** بەردی خەڵووزی، (باک.) بەرێ کومری.

**بەردیر:** بەردیل.

**بەردی کفتە:** بەردێکی پان یا ناوچاڵە، کە بە کوتکی گۆشتی بۆ کفتە و چێشتی دی تێدا دەکوتن.

**بەردیل:** بەرخەمێی یەکساڵانەیە، (باک.) بەرندیر، (هەو.) بەردیر، (زا.) بەرەندەر.

**بەردێلک** (باک.): هاوتا، بەرانبەر، هاونرخ، بەرامبەر.

**بەردێلی** (باک.): ژن هێنان بە خوشک گۆڕینەوە، گۆڕینەوەی چت بە چت.

**بەردین** (باک.): یەکێکی هێندە قەڵەوە، کە لەبەر قەڵەوی نەتوانێ بزووێ. لە بەردی دروستکراوە.

**بەردی نرخدار:** کەڤری بوها.

**بەردیوار:** بێ کەس و هەتیو.

**بەرڕادان** (باک.): گەمەکردن، لەگەمەدا دانان.

**بەرڕەتخستن:** بەرگیرخستن.

**بەرڕەتکەوتن:** بەرگیرکەوتن.

**بەرڕۆژ:** پێش هەتاو، بەرو بەرۆچکە.

**بەرز:** بڵند، ڕاسەرین، (باک.) ئەراوەند. بانی، کێل، بێند، حەوا، سەلیل، قیت، قووچ، ژوورروو، ژۆرروو، گەورە، خاوەندشان و شکۆ.

**بەرزا** (ئەردە.): منداڵی نۆبەرە، بەرزایی.

**بەرزانی:** بەرزایی، بەرزێنی.

**بەرزاخ** (ئەردە.): داوێنی کێو، بەرقەدی کێوی.

**بەرزاخوڕ:** وولاخێکە ئالیکی زۆری خرابێتە بەر و ئەوەندەی خواردبێ، کە خواردنی لەبەر چاوکەوتبێ، یا خۆخواردنی خۆشی درابێتێ و هی تری پێ نەخورێ.

**بەرزاندن** (باک.): شەڕکردن، کێشەکردن، ببەرزینە: شەڕوکێشەی بکە.

**بەرزانی:** (باک.) بەرهەس.

**بەرزاو:** بەراو، زناو.

**بەرزایی:** بڵندی، بڵندایی، بڵنداهی، شووێنی بەرز، ئەندازەی بڵندی چت.

**بەرزە:** وولاخی بەرزە، کەر، ئێستر، ماین، ئەسپ. چێشتی پلاو. (باک.) بزر، وون. ــ کرن: وونکردن.

**بەرزەئاخوڕ:** وولاغ وچارەوای بەرزە وەکوو ئەسپ، ماین، ئێستر، کەر. وولاخێکیشە ئالیکی زۆر درابێتێ بەدان کەوتبێ یا مستە ئالیک بێ.

**بەرزەبان:** بڕوانە: بەرزەکی بانان.

**بەرزەبڵسک:** بەرزەبڵۆسک.

**بەرزەبڵۆسک:** بەرزەبڵسک.

**بەرزەبڵێس:** کەسێکە لە هەموو قسەو ووتوو وێژێکیدا تێهەڵ بچێ بەرەنگێک، کە بەرامبەرەکەی دەمکوت بکات.

**بەرزە بڵێسوێنەتان:** تێ هەڵچوون لە هەموو جوورە قسە و ئاخەفتنێکدا و بەگژدەمیدا چوونەوە.

**بەرزەجووڕە:** ویزەویزە، کە لە بەرزە جوڕە گەورەترە. جوورە ویزەویزەیە، کە هەر جڕجڕ دەکات، زیرزیرک، زەمزەمۆک، ووزووزە، قازی بازی.

**بەرزەچڕە:** بەرزەچووڕە .

**بەرزەحەوایلە** (ئەردە.): کۆلارەی منداڵان، بادەوە، بەرزەهەوایلە، بازی هەوایی، بازی هەوایلە.

**بەرزەرین** (باک.): زەبەرجەد، یاقووتی زەرد.

**بەرزەرینە:** زوەبەرجەد، زەبەرجەد.

**بەرزەق** (هەورا): بەرداخ.

**بەرزەقانی** (هەورا.، جا.): قۆچەقانی.

**بەرزەکەوە:** قیسپ یا هەژگی لق و پۆپ نەکراوە، کە پەرژینی باغ و بێستان و چتی پێ بکرێت.

**بەرزەکۆڵ** (بابا.): قەڵاپەچن.

**بەرزەکی بانان:** بۆ کەسێک بەکاردەبرێ کە لە کێشەو قۆرتێکی ڕزگاری بوو بێ.

**بەرزەگەوە:** قیسپێکی هەڵنەپاچراوە و دەکرێ بە پەرژین بە بێ تەنین.

**بەرزەڵنگ** (هەورا.): ناڵ ناڵ. گیایەکە بستێک بڵندە و لاسکیشی وەکوو دەنکی شەمچە (شخارتە) ی باریکە، سەریشی خڕە پەلکی شینێکی ئاسمانییە، گوڵەکەشی وەکوو سەری شەمچەیە، بۆ بۆنخۆشی لە نێو لێفە و سەرین دەخرێ.

**بەرزەوەبوون:** بەرزبوونەوە، گەشەکردن، درێژبوون.

**بەرزەوەکردن:** بەرزکردنەوە.

**بەرزەووڵاخ:** مەبەس لە ئەسپ و ماین و ئێسترە.

بەرزە ووڵاخ

**بەرزەهەوایلە:** بادەوە. بەرد بۆ هەوا و بڵندی ئاوێژتن.

**بەرزبوون:** بڵندبوون.

**بەرزبوونەوە:** بڵندبوونەوە.

**بەرزپەڕین:** بەرزفڕین.

**بەرزتر:** ئەشپا. ــ ین: سەرپەڕ.

**بەرزفڕین:** بڵندفڕینی باڵندە و فڕۆکە. پێ لە ئەندازەی بەرەی خۆتێپەڕاندن، لە پلەی خۆ پتر بە خۆ خوڕین، قەپداگرتن.

**بەرزقەک** (باک.): ئەو خاک و بەردە بڵندانەیە، کە لە کەنار ئاو و دەریایاندا دەبینرێن. بەر هەڵستێکە لەدار دروستکرابێ.

**بەرزکردن:** بڵندکردن، ڕانان، وونارا.

**بەرزکردنەوە:** بەرزەوکردن.

**بەرزگ** (موک.): وەرزک، خووارەوەی زگ، پێش زگ، پێستی ژێر زگی وولاخ و ئاژاڵان، (هەورا.) وورگ زل، زگ زەلام.

**بەرزۆخە:** بەرزۆڵە.

**بەرزۆڵە:** منارە.

بەرزۆڵە

**بەرزی:** بڵندی، حەوایی، هەوراز، گڤاند، بەرزایی. گەورەیی، شان و شکۆ. کوتەپەڕێیەکە بۆ قایمی لە دیوی ژوورەوەی ئێخەی کراسی دەدەن: بەریەخە، (درە.) وەریەقە، (پیرا) بەربەروو.

**بەرزیلان** (ئەردە.): یاری شێر و خەتە بەپارە.

**بەرزین** (باک.): قەڵتاخ دارەکەی زینییە، (موک.، سۆرا.) جووانووێکە تەمەنی گەیشتبێتە ساڵی سێیەم، واتا لە ساڵی سێیەمدا بەرزینە و کاتی زینیەتی.

**بەرژەنە:** ژەمەنێک کەرە، ئەو بەشە ڕۆنە کەرەیەیە، کە لە مەشکە بێتە خوواریّ.

**بەرژەنەک:** دارێکی تەنکی پانە لەبەردەمی دانە و گورد دادەنرێ، بۆ ڕاگرتنی ئەندازەی پانی تەنراوەکە بۆ ئەوەی خوار و گێڕ نەبێ.

**بەرژەند** (خۆ.، کۆ.): بەرە، چەخش، بەرژەوەند.

**بەرژەنگ:** بڕوانە بەرژونگ، سەرەتا.

**بەرژەوەند** (کۆ.، دەر.، موک.): بەرە، چەخش، بەرژەند.

**بەرژەوەندی:** بەرژەندی، چەخشی.

**بەرژۆر** (باک.): بەرەوژوور.

**بەرژێر** (باک.): بەرەوژێر.

**بەرستە** (باد.): بەردەستێ.

**بەرستەک** (باک.): بەرستۆ، ئێخە.

**بەرستۆ** (باک.): ئێخەی پژمل و گەردن، (باک.) پەرستۆک، (باک.) بەرسکوور، بەرۆک.

**بەرستۆک:** بەرەستۆ.

**بەرسفکە** (زێ.): هەیوان، بێلاّیی.

**بەرسڤ** (باد.): وەلاّم.

**بەرسکوور** (باک.): بەرستۆ، ئێخە.

**بەرسمێڵ:** سەری مووەکانی سمێڵ، کە لەسەری لێوی سەرەوە تێپەڕێ ــ ی پێ دەڵێن، (باک.) بسمبل. ــ دار: بسمبل دار.

**بەرسووکە** (موک.): قالۆچە سوورکە.

**بەرسووڤ** (باک.): هەموو چتێکە، کە پاشە و پاشکرابێ و هەڵگەڕابێتەوە.

**بەرسیچکە** (فە.): نزگەرە.

**بەرسیمانی** (باک.): ئەو ئامرازەیە کە چتی پێ مشت و ماڵ دەکرێ.

**بەرسیڤ** (باک.): وەلاّم، وەلاّمی نووسراو. ــ دان: وەلاّم دانەوە.

**بەرسێڵ:** جوورە کوللێرەیەکە بەساج دروستکرێ.

**بەرسیلە** (بابا.، شارە.): (هەو.) پەسیرە، (کۆ.) پەرسیلە، پەسیلە، (موک.) قۆرە، (هەورا.) هاڵە (لە ئاڵبوونەوەی ددانە)، ترێی نەگەیشتوو.

**بەرسینە:** بەرسینگەی ئەسپی، سینەبەرە.

**بەرسینچکە** (هەو.): نزگەرە.

**بەرسینگ** (باک.): سەرسینگە، بەرسینگەی منداڵان. بەرسینگەی وولاّخی، قایشێکە دەکەوێتە بەرسینگی وولاّخی بەرزە لەکاتی زین کردنیدا.

**بەرسینگە:** ــ ی منداڵان، بەروانکە. ــ ی وولاّخی: بەردلک، (باک.) بەرە.

**بەرسینگەی وولاّخی:** قوویش.

**بەرش:** بەنگ.

**بەرشکستە:** بەرشکسە، لێ قەومیاگ، لێ قەوماو.

**بەرشۆ** (باک.): جلکی گۆڕینێ، کراسێکە کاتی جلشووشتنێ لەبەری دەکەن.

**بەرشووش** (باک.): بەرسووڤ.

**بەرشیەی** (هەورا.): دەرچوون، چوونەدەر، لەجێ چوون، لەگەچوون، جەدەس ــ : لە دەس دەرچوون.

**بەرشیڤ** (باک.): خوواردنێکی سووکە لە پێش نانی ئێوارێدا.

**بەرشین** (هەورا.): چوونەدەر، دەرچوون.

**بەرشێو:** خواردنی ئێواران، بەربانگ. ــ کردن: نانی ئێواران خواردن.

**بەرغەڵ:** مێگەلی کار و بەرخان، بەرگەل، بەرخەڵ.

**بەرغەلەوان:** بەرخەوان.

**بەرغەمۆت** (باک.): جۆرە میوەییەکە.

**بەرف** (باک.): بەفر. وەروە.

**بەرفەشۆ** (باد.): شڵێوە، بەفرو بارانەیە، کە پێکەوە ببارێن.

**بەرفەک** (باک.): جۆرە پێچ و مێزەرێکە.

**بەرفەندە** (باک.): بەسەختی ڕووخانی ڕنووە بەفر لەشاخانەوە.

**بەرفخۆرک:** جۆرە تەرزەیێکی وردە دەباری و بەفری دەتاوێنێتەوە.

**بەرفرێدان:** بەراوێژتن، بەرهاوێژتن، بەرخستن، لە بارچوون.

**بەرفمالک:** بەفرماڵ، بێڵی بەفری.

**بەرفۆ:** ناوی ئافرەتانە.

**بەرفهوورک:** گلێرە، پارچە بەفری وێک کەوتوو و ڕەق.

**بەرفێ:** بەرف لە دۆخی بانگکردنێدایە.

**بەرفی مالک** (باک.): بێڵی بەفرماڵینییە.

**بەرڤالە** (باک.): هەژار، دەست بەتاڵ.

**بەرڤان** (باک.): شوان.

**بەرڤانەک** (باک.): بەرهەڵبێنە.

**بەرڤانک** (باد.): بەرکۆش.

**بەرڤە** (باک.): قەد. ــ کرن: قەدکردن. (باک.) دادڕین. ــ کرن: دادڕینە خوارەوە.

**بەرڤەرژێر** (باک.): سەرەوژێر.

**بەرڤەکری** (باک.): گوشاد، بەروەدە.

**بەرڤین** (باک.): مردن لە ڕێگایەکی ناشیریندا.

**بەرقەپ** (ڕەوا.): دارێکە ڕووی لە شکان و کەوتن بێت، (هەورا.) پوواو

**بەرقەد:** (هەورا.) کاو، (ڕۆژ.) ئاڵان. ــ ی کێوان: تەلان، بەندەن، هەڵست، قەد، پاڵ، قەدپاڵ.

**بەرقەدێر** (باک.): پارێزەر.

**بەرقەلیان:** بەرچایی، بەردڵ، ناشتا. ــ ی: بەرقەلیان.

**بەرقەم** (خۆ.، ڕەوا.): جۆرە ڕەنگێکی سوورە.

**بەرقەندە:** بەرچا، ناشتێ، بەرقەلیان، بەرقەندە.

**بەرقین** (باک.): قەڵشین، پارچەپارچەبوون.

**بەرقلیان:** بڕوانە: بەرقەلیان.

**بەرک** (باک.): بەردی گچکە، گوللە. ــ ێ تفەنگێ: گوللەی تفەنگێ. ــ ێ تۆپێ: گوللەی تۆپی، ئەستێرەیەکە بە ئارەوی (شیعرای شامی) یە.

**بەرک** (باک.): بەرەی گچکە، (هەورا.) گیرفان.

**بەرکار:** کەرەستەی خانوو، کە ئامادە کرابێ بۆ کردنی.

**بەرکاز** (باک.): دەلاقە، پەنجەرەی چکۆڵە.

**بەرکانی** (باک.): قۆچەقانی، بەردەقانی.

**بەرکاو:** بەرزاخ، بەرقەدی کێوی.

**بەرکە:** دەرک، ماڵ، خانوو.

**بەرکەتی** (باک.): گرنگ، بێشەم، (باد.) کەم هەڵکەوتوو، نایاب، بەنرخ و گرانبەها.

**بەرکەردەی** (هەورا.): دەرکردن.

**بەرکەش:** سینی.

**بەرکەڤ** (باک.): دەرفەت.

**بەرکە:** لە بەرەکەتی ئارەوی وەرگیراوە لەکاتی نزادا دەڵێن: مانگاکەت بەرکەی کا: واتا شیری زۆر بێ.

**بەرکەفتن:** پێشکەوتن، وەبەرکەوتن. بەرکەک (باد.): پەیژە، پێ پیلکە، نێردیوان.

**بەرکەکردن:** بەرەکەت کردن.

**بەرکەڵ:** نێوون، نێنگووین، کە کاتی کەڵ گرتنی هاتبێ.

**بەرکەمەر:** گیایەکی بۆنخۆشی گەرمێنییە.

**بەرکەواندن** (باک.): پێکان، لە نیشانەدان.

**بەرکەوت:** بەش، پێ بڕان.

**بەرکەوتن:** وەبەرکەوتن، پێکران، ئەنگێوران. پێ بڕان، پێم بڕا، وەبەرکەوت، ئەویش ئەوەندەی پێ دەبڕێ. پێشکەوتن. وێکەوتنی چتێک لە چتێکی تر، شووشەکە بەردێکی بەرکەوت. نۆرە و نۆبە دەستکەوتن؛ دوێنێ زوو نۆبەم بەرکەوت.

**بەرکەیە** (باد.): نووێنەر، یارمەتی دەر.

**بەرکردەی:** بڕوانە: بەرکردن.

**بەرکردن:** لەبەرکردن، ئەزبەرکردن. پۆشین، لەبەرکردن، پێ پۆشین.

**بەرکۆ:** قەڵپووزی زین، قەرپووز. بڕێتییە لەو چتەی سوار لەبەردەمی خۆیدا بنێ یا بەقەڵپووزەکەیەوە کات بە پێچەوانەی پاشکۆ.

**بەرکوو:** قەڵپووزی زین.

**بەرکوت:** ــ ی دەغڵی: لاکوت، (سوور.) خەویە، کەمێک دانەوێڵەیە، کە لەپێش کوترانی خەرمانێدا دەکوترێ بۆ نان یا لە ئاش دەکرێ.

**بەرکور** (باک.): کەسێکە دووچەنەگەی بێ، بەرخەبەبەدار، گۆشتی ژێر چەنەگەی مرۆی قەڵەوە، کە دادەکەوێ.

**بەرکورە:** باڵندەیێکی شینە وە کۆتری دەچێ بەرسینگی ڕەشە و دەنگیشی زۆر خۆشە لە شاخاندا لە شوێنێکی وادا، کە بارانە نەیگرێ هێلانەی لە قوڕ و بنێشتی دروست دەکات و زارکێکی تەنگی تێدەکات بە بەردیش بە زۆر و ڕەنج دەشکێ.

**بەرکۆز** (باک.): دانگە، ئەو جێگایەیە، کە لە زستانێدا تفاقی لێ دەدرێ بە ئاژاڵان.

**بەرکۆژە:** دووگمەی قەیتان، دوو پارچە قەیتان یا دەزوو لە جیاتی دوگمەیە لای ژووررووی ئێخەی کراس یا کەوای منداڵانەوەیە لێکیان گرێ دەدەن، (دەر.) بەندیەقە، (هەورا.) وەرکوڵ. (هەو.) پێشگیرە.

**بەرکۆسە:** بڕوانە: بەرکۆستە.

**بەرکۆستە:** پیاوی ڕیش تەنک.

**بەرکۆسەڕ** (باک.): ئەو پیاوەیە ریشی تەنک بێ، کۆسە.

**بەرکۆش** (باک.): بەرهەڵبێنە، پێشگیرە.

**بەرکۆشک** (کۆ.): هەیوان، هەیوانی پێش باڵەخانەی.

**بەرکۆف** (باک.): تەختە بەردی خڕی قەلاّتێ، بەردێکە پەناو پەسیو بێ.

**بەرکوڵ**: سەرکوڵ، (هەورا.) وەرکول.کەمــە چێشــتێکە لــە پێــش گەیشــتنیدا بخورێ. ـــ کردن: کــەمێک لــە چێشــتێک خــواردن لــە پێــش پێگەیشتنیدا.بەرکوتی دەغڵی، سەرکوڵ، بەرکوڵ.

**بەرکۆڵـە** (ڕۆژ.): پارچەدارێکــە لــە نێوانــی باســک و مژانــەدا ڕژدی و مــاڵی هــەوجاری پێ ڕاست دەکرێتــەوە، دارێکــە دەخرێتــە نێوانــی مــژان و نیرەق تا کار باش بکات.

**بەرکێشک** (باک.): چەکمەجەی مێزان و هی تر.

**بەرگ**: جلک، پۆشاک، کنج، پەلک، کالا، ڕەڤی. بــەرگی پــەڕتووک و پــەڕاوییان و نیــتر، (باک.) بەلگــە، جــز. گــەڵای دار و درەختــی ســەوز. ڕەوشــتوخوو، بــیرو بــاوەڕ. پێشــوو، بــەرێ: جــاری بــەرگ هــاتم: جــاری پێشووهاتم.

**بەرگاز** (باک.): خەڵفی هەنگووین، خلێف.

**بەرگاویلکە**: بەراویلکە.

**بەرگایی**: پێشکەوتنی یەکێک لـەبـەردەمی گایەکـەوە، کـە تـازە خرابێتـە ژێر جووت یا گێرەوە بۆ ڕاهێنانی.

**بەرگاییلکە**: باڵندەیێکی گچکەیە و شینە زۆرتـر لـەبـەردەمی گاجووتـاندا دەنیشێ و کلکی هەڵدەتەکێنی، بەراویلکە، بەرگاویلکـە، پێشـگاییلکە، کلک هەڵتەکێنە، کلک هەڵسەنگێنە.

**بەرگە**: تووانایی، تـاب، تـاو، بـار، وەرگـە، بەرووسـت، تاووشـت. ـــ گرتن: خۆڕاگرتـن، وەرگـەگرتن، لـەتووانادابوون، پێکـران، لـەباردابوون، بەرگرتن، بەرووستان، پێ وەستان، دەربردن. ـــ نەگر: دەرنەبەر. ـــ نەگرتن: تـاووش نـەهاووردن، دەرنــەبردن، بەرنـەگرتن، تـاو نـەهاووردن. (ڕۆژ.) زمانە چکۆڵە. (باک.) سوو، تاسوو، دیمەن، بەرچاو.

**بەرگەدە**: بەر، گەدە، گەدگ.

**بەرگــەر**: پلـەی ڕوکـاردار. تکـا، هێڤـی. ڕامیـار، کــەمۆ، سیاســی، ڕەنێوهێنــەر، بەرێوەبــەر، کـارزان، حـارێن، حاوێنــەر. (بـاد.) جامخانــە و شووشەی بەردەم.

**بەرگەرەکی**: گیانداری جووانی ڕێکوپێکی شۆخ و شەنگ: ئەم پیاوە یا ئەم ئەسپە یان ئەم کەڵەشێرە بەرگەرەکییە.

**بەرگەردان**: قاقەزی کاربۆن.

**بەرگەردن**: تینتینۆکە.

**بەرگەرین** (باک.): تکاکردن.

**بەرگەش** (باد.): سینی زۆرگەورە.

**بەرگەشتە**: گەڕاوەوە، بەدبەخت. ـــ یی: بەدبەختی.

**بەرگەشتەیی هاتن**: بەدبەخت بوون.

**بەرگەشتی**: بەرگەشتەیی.

**بەرگەشی**: سینی، مەجوعمە، خووان.

**بەرگەگر**: بەرگر، خۆگر، شازدە هەناسە.

**بەرگەگرتن**: خۆڕاگرتن لە ژێر بارێکی گراندا.

**بەرگەگری**: خۆگری.

**بەرگەڵ**: بەرغەل، بەرخەل.

**بەرگەلاّ**: بەرێکە سوور و سپی واشە لە گەڵای دارە مازووەوە پەیدا دەبێ.

**بەرگەلەوان**: بەرخەوان.

**بەرمێ** (هەورا.): کووزەڵە.

**بەرگدروو**: جلدروو، کالاّدروو.

**بەرگدروون**: جلدروون.

**بەرگدرووێتی**: پیشەی جل وبەرگ درووێنی.

**بەرگر**: بەرگرد، پێشگر، بەرهەڵست، نەهێز، پەکخەر، قۆرت، نــەهێڵ. بەرگەگر.

**بــەرگرتن**: بەرگــەگرتن؛ ئــەم بارگێنــە بــۆ ئــەو بــارە قورســە بەرگــەناگرێ. پێشگرتن بۆ تـاو و گیـان لـەبەرە. پژاندنی ترش و خووێ بە دەم و چاوی کەسێکیدا، کە تـاورەی گرتبێ، لەلایەن یەکێکەوە کـە مندالّـی بـە تـاوور سووتابێ بۆ ئەمەی، کە چاک بێتــەوە. هاتنە بـەری دار و درەخت. تـاووس بوونی هەموو گیاندارێک تەنها ئافرەت نەبێ. بەربەستکردنی چتی ڕەنگ کراو. پێشگرتن، بەرهەڵستکردن.

**بەرگرد**: چتێکە لـەبەر دەستدابێ و بەکار بێنرێ بۆ ئەمەی ئەو شتەی، کـە لـەم باشترە جارێ بەکار نەهێنرێ و بمێنێتەوە.

**بەرگردەڵە**: دارێکی خڕی گردە، بۆ داگرتنی بەرداشی ئاش، وەستا لـەگەڵ پازناودا بەکاری دێنێ.

**بەرگری**: بەرهەڵستی، بەرامبەری.

**بەرگ تێگر**: دارێکە دەخرێتە ناو تەونەوە بۆ ئەوەی کە ڕێک ڕاوەستێ، بەرگرد.

**بەرگساز**: بەرگ درو.

**بەرگسازی**: پیشەی جل وبەرگ درووێنی.

**بەرگفانووس**: کراسی فانووسی.

**بەرگ گر**: بەرگ تێگر.

**بەرگن**: (هەو.) وەرگن، لووا، تووکی بەرخ و کاوڕی یەکساڵەیە، کە بۆ جاری یەکەم برابێتەوە.

**بەرگوواره** (ڕەوا.): زەنگەتەترێ.

**بەرگۆتن**: سەرەتا، پێشڕەو.

**بەرگورد**: دارێکە تەونکار بەکاری دێنێ لەکاتی تەوون کردندا بۆ ئـەوەی تەونەکەی لارنەبێت.

**بەرگ ووراز** (هەورا.): بەرگدروو.

**بەرگووز** (باد.، زێبا.، بار.): (دەر.) چۆغە، چۆغەڵ.

**بــەرگوزیدە**: هــەڵبژێردراو، هــەڵبژنیاگ، هــەڵ چنیــاگ، بژنیــاگ، پەســن کریاگ.

**بەرگێ** (خۆ.): بنانگووێ.

**بەرگیر**: بەرهەڵست، بەرگر، بەرگێو، پێشگر، پێشــگیر، نــەهێڵ، نـەهێز، پەکخـەرە، دەسـگیر، پاگیر. (باک.) بـارگێن، بارگیر. جـوورە مارێکـە ژەهراوی و کوژندەیە، (باک.) بەرگیل.

**بەرگیرخستن**: پەیدا کردنی چتێک و خستنە ژێر دەست.

**بەرگیرکەوتن**: هاتنە ژێر دەستی چتێک، کە بەدوویدا عەوداڵ بوویی.

**بەرگیری:** بەرگری، بەرهەڵستی، پێشگیری.

**بەرگیری کردن:** بەرهەڵست وەستان.

**بەرگیل** (باک.): جۆرە مارێکە. بەرگیری، بەرپێچ، بەربەن، بەربەس.
ـــ دانەوە: بڕدان، بەرپێچ کردن.

**بەرگین** (ئەردە.): پێشوو.

**بەرگێو** (باک.): بەرهەڵست.

**بەرما** (باک.): پاشماوە، بەرماوە.

**بەرماخ:** قاقەزێکی لوولەکراوی باریک و درێژە تووتنی تێدەکرێ و دەکرێ بەجگەرە، بەرماغ، قەمیش، قامیشی جغارە. ـــ ی قونچکدار: قەمیشی قنچکدار.

**بەرماغ:** بەرماخ.

**بەرماڵ:** ڕووخست، بەرماڵی نوێژی، (هەو.) دووگرد، دووگورد، (هەورا.) مازلۆغ، (باد.) شەمڵ، شەملک، (جا.، هەورا.) جاغاز، جانوماز، (زاخ.) شەمل، (ئەردە.، دەر.) جارماز، جانماز. پێشماڵ، دەرماڵ، دەرمال، ماوەیێکی تەختکراوە لەبەر دەرگای ماڵان. دووتەختە دەواری لێکدراوی ئامادەیە بۆ ئەوەی هەرکاتێکی بایەکی بەهێز هات لە تەنیشت ڕەشماڵەکە بگیرێ و بەچەند سوولەیەک لە دەوارەکە قایم بکرێ بۆ بەربەستنی بایەکە.

**بەرماڵان:** پێش ماڵان، دەرووبانا.

**بەرماڵک** (باک.) بەرهەڵبینە، (باد.) جاجم.

**بەرماڵی** (باک.): کارەکەر، کڵفەت، کەیبانووی ماڵ.

**بەرماڵێ:** بڕوانە: بەرماڵی.

**بەرماوە:** پاشماوە، پاشمرۆک، (باک.) بەرما، (هەو.) پاشخوان.

**بەرماوەخۆر:** پاشماوەخۆر.

**بەرماوەخۆری:** پاشماوەخۆری.

**بەرمەجێڵ** (ئەردە.): دەرگای چەپەر.

**بەرمەغار:** هاڵ، غار، ئەشکەوت.

**بەرمەکانە:** منداڵی شیرەخۆرە. دراو یا جلێکە، کە ماڵی زاوا دەیدەن بەدایکی بووکی.

**بەرموور:** (دەر.) ملوانکە، ملوانە، گەردانە، کرتەمر، (پێـن.، جا.، مەر.) گرتەمر، (جا.، کۆ.) خەناوکە، جۆرە ملوانەیەکە ژنان بۆ جوانی ڕاست و چەپ لە ملیانی دەکەن.

**بەرمووڕە:** بەرموور.

**بەرمووسڵدان:** خووار ناووک.

**بەرمیز** (ڕەوا.، خۆ.): کەمێڵی پاشڵی ئاژاڵانە.

**بەرمیزە:** (هەو.): چڵکێکە بەسەر پێستی ئاوڕانی مەڕییەوەیە هی ئەو شوێنەی، کە بێ تووکە بۆ برینی نوو یەکاریەکە، بۆ برینی قووڵ چڵکەکە، کە نەرم و چەورە دەکرێتە پلێتە لە ناوی دەنرێ، کە قووڵ نەبێ لەسەری دادەنرێ.

**بەرمێلک** (شار.): جۆرە قەزوانێکی ناسک و پانە وەکوو نیسکی وایە لە جێگایانی تووش و سەخت پەیدا دەبێ.

**بەرمیل:** جۆرە سندووقێکی گردی قووڵە لە لەوح یا لە تەختە.

**بەرناڤ** (باک.): بنی دۆڵ و شیوو دەرەیە. هەوەڵی دۆڵ و شیوو دەرەیە. سەرناو، نازناو. ڕاناو. بناو (دارێکە).

**بەرناڤدان** (باک.): تێکەڵکردن، تێکەلاوکردن.

**بەرنامە:** بارنامە، کارنامە، ڕێڕاز، پرۆژە، پرۆزە، پرۆگرام.

**بەرناو:** بڕوانە: بەرناڤ.

**بەرنە:** بەرەوە، بەرندە، ئەوکەسەیە لەگەمە یا قومارێدا بباتەوە. ئەو کەسەیە کە چتی ببات.

**بەرنەگر:** بەرگەنەگر.

**بەرنەوال:** (باک.) بەرنال.

**بەرنەدێر:** بەرندیر، مەڕێکە دوو ساڵی تەواوکردبێ ڕووی لە سێ ساڵی کردبێ، مەڕی سێ ساڵانە.

**بەرنگار:** گژ، ئاوڕیش. ـــ بوون: بەگژ داچوون، ئاوڕیشبوون. ـــ ی یەکتری بوون: پێکهەڵپڕژان، دەست ئاوێتن هەڤ، بەگژ یەکتریداهاتن.

**بەرنووت:** تۆزی تووتنییە بۆپشمین لە کەپۆ دەکرێ.

**بەرنووێژ** (زەن.): پێش نوێژ، کەسێکە پێشنوێژی بکات. (زەن.) ـــ ی: پێشنوێژی.

**بەرنیا** (دزە.): گاسنێکی کەمێک کۆڵ بووبێ پارچە ئاسنێکی داوێنە سەری و تیژی دەکەنەوە بەوکردەوەیە دەڵێن بەرنیا.

**بەرۆ** (هەورا.): دەرەوە.

**بەروو:** پێشوە، (باک.) مەمک.

**بەڕوو:** (باک.) دەمەل، قۆپک، (هەورا.، فە.) بەلوو، بەڕوو، دەڵێن دوو جۆرە بەڕوو هەیە بەڕووی دارە مازووی ناخورێ، سێ جۆرە دار هەیە بەڕووی دەگرێ. ۱) دارە بەڕوو. ۲) مازوو (مازوو و جەوتی دار بەڕوو لووس و بێ گرێ و قۆرتە). ۳) داروول. بەڕێز، پایەبەرز.

**بەروار** (باک.): بەتیلاک و تیلاک بە چیا هەڵچوون. مێژووی ڕۆژ و مانگ و ساڵە. (باد.) کوێستان. ناوی چەند ناوچەیێکییە لە ئامێدی.

**بەروارک** (باد.): قەرتاڵە.

**بەرواری باڵا:** ئێوی هۆزێکی کوردە لە باکووری مووسڵ، بەرواری باڵاو بەرواری ژێری دووپارچەیە، ئێوی دێیەکیشە، ناوی کێوێکیشە لە نێوانی

**بەروال** (باد.): ڕێگای خووار و خێچی سەختی ناوشاخان.

**بەروان:** پێشگیرەیێکی تایبەتییە لەکاتی نان خواردنێدا بەسەر کۆشی دادەدەن، بەروانکە، بەروانک.

**بەروانک:** بەروانکە.

**بەروانکە:** بەرسینگەی منداڵانە، (دەر.) وەریەقە، (هەورا.) وەروانە، وەروانکە، (کۆ.) بەرسینگەی منداڵان. بەرهەڵبێنە. (هەر.) بەڕوولە.

**بەرۆنێنک** (باک.): هەنیە هەڵگرتن.

**بەروە** (هەورا.): دەرەوە.

**بەرووبا:** ڕوویەبا، ڕوو وەبا.

**بەرووبەر:** بەرەبەرە.

**بەرومج** (باک.): جۆرێ پۆڵایە، تفەنگی دێغ دێغی لێ دروستدەکرێ. ـــ ی گر، ـــ ی هوور، ـــ ی زەر، جۆرێ تفەنگە.

**بەرووەدان:** بەردان، بەرەڵاکردن، ئازاد کردن. کوردستانی بادینیّ و باکووریّدا.

**بەرواری زێڕی:** هۆزێکی کوردە و دێیەکیشە و چیایەکیشە لە نێوەڕاستی سنووری کوردستانی بادینان و باکووریّدا.

**بەرواژی** (ڕەوا.): پێچەوانە، ئاوەژوو، واژی. ـــ کردن: واژی کردنەوە.

**بەرووەدە** (خۆ.): بەراوەڵە، پێش ئاوەڵە، بەربەرەڵا، پێش بەرەڵا، گوشاد، فراوان، پێش گوشاد و فراوان.

**بەرووەست:** بەرگە. ـــ کردن: بەرگەگرتن. بەرهەڵست.

**بەرووەستا** (باد.): شاگرد.

**بەرووەستن:** بەرگەگرتن، لەباردابوون.

**بەرووەسێڵ** (باد.): ئاگردان، ئاووردان.

**بەرووەشێن** (ڕۆژ.): ئەو تۆوەیە کە لە پێش جووت کردندا دەچێنرێ.

**بەرووەکۆپە:** بەرووی کۆپە بەری داروولەیە و بەراز نەبێ هیچ گیان لە بەرێک نایخوات.

**بەرووەنە** (ڕۆژ.): ئەوەیەکە منداڵ یا بێچووی لەبەر چووبێ، بەرهاوێژتوو، بەراوێژتوو.

**بەرووەنن** (ڕۆژ.): بەراوێژتن، بەرهاوێژتن.

**بەروباو** (هەورا.) بەروبۆ، بەروبووم، بەرەجووت. ڕووشە، کارسات، گێچەڵ، هەنگامە؛ یا خووا لەو بەروباوە بە دووربیّ: لەو ڕووشە و کارساتە بە دووربیّ.

**بەروبۆ:** بەروباو، بەروبووم، بەرەجووت، وەرز، داهات، بەرە، ڕەوار، خولندۆت. ـــ دار: بەروبوومەدار. ڕووشە، کارسات، گێچەڵ، هەنگامە؛ یا خووا لەو بەروبۆیە بەدووربیّ: لەو ڕووش و کارسات و گێچەڵانە بەدووربیّ.

**بەروبوو:** بەربەیار، زەوییەکە بەبیّ شیوکردن بچێنریّ.

**بەرووبووم:** داهات، بەرەچوون. ناوچە، سەرزەوی.

**بەروبێشک:** بە بێشکەیێک دەگوترێ کە دۆشەگەڵە و دەسرازە و کەل و پەلی منداڵی تێدابیّ.

**بەرووپشت:** هەردووک ڕوو، هەردووک دیو و ڕووکاری چتێکی، دەورووبەر. ـــ کردن: وەرگێڕانی ئێخەی کراس بە جۆرێک، کە پشتەکەی لە بەرساغی بکەوێتە پێشەوە و پێشەکەی لەبەر دڕاوی بکەوێتە پاشەوە.

**بەرووتر:** پێشتر.

**بەرووترین:** پێشترین.

**بەرووخۆرە:** باڵندەیێکی بەڵەکە کەمێک لە ڕەشۆڵەی گەورەترە بەروو و بادامی دەخوا و لە ناو خۆڵیّ و دوو فلیقانەی داراندا بۆ کاتی برسێتی دەشیان شارێتەوە.

**بەرووخووار:** بەرەوخووار، بەرەوژێر، لە پایەدا گچکەتر.

**بەرووودار:** دارە بەروو.

**بەروودووا:** یەک لەدوای یەک؛ کوردۆ و ئازاد بەروودووا لە دایک بوون. بەرەودووا بەشووێنی یەکتریدا. گەڕاوەوە، گەڕاگەوە. ـــ خستن: پاشوپێشکردن، بەروودوواکردن. ـــ کەفتن: شووێنی یەکتری کەوتن. ـــ کەفتنی پا: پاوەپاکردن، دوودڵ بوون. ـــ کەوتن: پاش و پێش کەوتن. ـــ کردن: بەروودوواخستن، ناردنەوە، گەڕاندنەوە. ـــ نان: ڕاونان، ڕەپێنان.

**بەرۆژ:** لەکاتی ڕۆژێدا، (باد.) بەربەرۆچکە.

**بەرۆژوو:** ڕۆژوو وان، بەرۆژی. ـــ بوون: ڕۆژووگرتن.

**بەرۆژی:** بەرۆژوو.

**بەرۆش** (باک.): دیزە، مەنجەڵ، مەنجەڵۆکە، دەستە مەنجەڵ، پاتیلە.

**بەرووش:** دەستە مەنجەڵ.

**بەرووڤاژی:** بەرواژی، بەپێچەوانە.

**بەرۆک:** ئێخە، یاخە، یەقە، یەخە، (باد.) بەریک، بەرووک. (باد.) گیرفان. تووربین، توورەکە. ـــ ی ئەسپی: بەرسینگە، بەنێکە یا قایشێکە بە جل و زینەوە لە بەرسینگی وولاّخی قایم دەکرێت.

**بەرۆوک** (باک.): دارێکی بچووکە لە نێو شورک و هالەت دادەنرێ، لەبەر ئەوەی وەکوو بەرووییە ناوی نراوە بەرۆوک.

**بەرۆک بەردان:** بریتییە لە دەست لێک بەردان، وازهێنانی یەکێک لە یەکێکی.

**بەرۆک گرتن:** شەڕپیّ فرۆشتن، تەشقەڵەپیّ کردن.

**بەرووک** (باد.): بەری درۆێنەیەکە بۆ ماوەیێکی بۆ دروونەوە دابڕابیّ. گەوەڕ، گیرفان.

**بەروولە** (موک.): نیرنیرە، (موک.) شیلەپە، پارچەدارێکە لە نێو کونی شیلەپی جووتی دەنێن تا نەجوولیّ و نەیەتەدەریّ، (هەو.) بەروانکە، (ڕۆژ.) کرمە. قیسکە، ترێنزوو و خەیاری ناسک. چەند سینگێکی باریکە تەختەی دەواری پیّ لێک دەدریّ. گاییزجە. چەمیلە. دارێکی گچکەیە لە ناو کونی هەیە دەنرێت تا هەیەکە دەرنەچێت.

**بەروولە:** گاسنێکی کەمێک کۆڵ بوویّ پارچەیێکی گچکەی پۆڵا دەخەنە سەری و تیژی دەکەنەوە بەو کردەوەیە دەڵێن: پۆلانیا، بەرنیا. بەلووجە.

**بەروولە خۆرە:** کونی هەیە.

**بەروونکار:** ئاست، بۆ دیار، بۆ پێش، هەمبەر، هاف.

**بەرهاوێژتن:** بەراوێژتن، بەرخستن، (ڕۆژ.) بەرووەنن، (باک.) بەراڤێتن.

**بەرهاوێژتوو:** بەراوێژتوو، بەراوێتە، (ڕۆژ.) بەرووەنە، لە بارچوو.

**بەرهەتاو:** بەرتاو، بەرخۆر، بەرڕۆژ، بەر بەرۆچکە.

**بەرهەڤ** (باد.): چتی ئامادەی دەردەست.

**بەرهەڤدان** (باک.): کۆکردنەوە، کۆمکرن، جڤاندن، بەرەڤ کرن.

**بەرهەڵبێنە:** پێشگیر، پێشگیرە. (باک.) بەرمالک، بەرڤالەک، (باک.) بەرڤانەک، بەرکۆش، (کۆ.) بەروانکە. پاشۆل، بەرامپیل، بەرانپیل، چادرک، (دز.) بەراپیل.

بەرهەڵبێنە

**بەرهەڵدان:** بەرەڵاّو ئازاد کردنی بەندی و گیان لەبەرانی گیراو و دەست بەسەر، دەرگا کردنەوەی باوبژی ناو زگ.

**بەرهەڵست:** چتێکە پەکی کارێکی بخات و نەیەڵیّ سەربگری، بەربەست، بەرووەست، کۆسپە، ئاستانگ، سکر، (باک.) بەرگێو. ـــ کردن: بەر برینەوە، بەرووەستن، نەهێشتن. ـــ ی: بەرگری، بەربەستی.

**بەرهەم:** بەروبوو، بەروبۆ، دەستکەوت، قازانج لە کشتوکاڵ و ئیتردا.

**بەرهەمهێنان:** پێگەیاندن و هێنانە ئاوی چتێک، بەرووبۆدان، بەخێوکردن، ڕەنێوهێنان، بۆ گیان لەبەران.

**بەرهەنگ:** (دەر.، ڕەوا.، خۆ.) بەرەنگ، دەردێکی ناسراو و دیارە.

**بەرهەنگدار:** بەرەنگدار. ــ ی: بەرەنگداری.

**بەرهەوا** (باک.): بێ جێ، بێ کەڵک.

**بەرهس:** ــ کرن: وەدەرخستن، دەرهێنان، بەرزانی.

**بەرهۆ** (باک.): کورتکراوەوەی (ابراهیم)ە.

**بەرهوور:** تفەنگی خەتخەتدار، تفەنگی لوولەتەسک.

**بەرێ** (هەورا.): دەرکە، دەرگا. (باک.) لەپێشدا.

**بەریان:** جێگای شکاندنی دەراوی جۆگە و یا رووباری. رێ گوزاری ئاوویا: بەریانی ئاوەکە یا بایەکە بگرە. گرتنی رێگای ئاوە بۆ پەنگ خواردنەوەی بۆ مەبەستێ، جێگای شکاندنی ئاوی کشتوکاڵ.

**بەرێ خوودان:** رووتێکردن، تەماشاکردن.

**بەرێ:** بەجێ، پەسند، وەرێ. ــ بوون: وەرێ کەوتن. ــ کردن: وەرێ خستن، رێکرن. گوزەران، خێو. ــ بردن: بەخێوکردن، پەروەردەکردن. ــ چوون: گوزەرانکردن، بەرێچوون، بەخێوبوون.

**بەریی** (باک.): دەشت. گیرفان. (لو.) بەروو. پێشوو. بەردار. بزنا چاربەری: بزنی چووار ساڵانە.

**بەریەخە:** کوتە پەڕۆیەکە بۆ قایمی لە دیوی ژوورەوە وەبەر ئێخەی کراسی دەدرێ، (دەر.) وەریەقە، (پیرا.) بەربەروو، بەرزی.

**بەرێ بردن:** بەخێوکردن، پەروەردەکردن.

**بەری پەرەگەڵا:** چتێکی ووردی خڕە لەپشتی گەڵای مازوو پەیدا دەبێ.

**بەری پێ:** ژێری پێ، سینکی پێ، بنی پێ.

**بەرێچوون:** گوزەرانکردن، بەخێوبوون.

**بەریخە:** پارچەیێکە بۆ قایمی لە پێش ئێخەی دەدروون.

**بەرید:** پۆستە، چەپەر، لە (بردن) ەوەیە لە پێشدا کوردان تا دووایی سەردەمی سەلاحەددینی ئەیووبی هەر بە کاریان دەبردو ووشەیێکی کوردییە.

**بەریدەست:** لەپی دەست.

**بەرێز:** بەقەدر، بەروو، سەنگین، ماقووڵ.

**بەریساندن** (باک.): جوورە تڕییەکە.

**بەریش:** دۆبردە، نەخۆشییێکی ئاژاڵ و ماڵاتانە گووانی دێشێ و شیری ووشک دەکات.

**بەریشانی** (زا.): شووان.

**بەریک** (باد.): (باد.) بەرۆک. گیرفان.

**بەرێکردن:** رەوانەکردن، خستنەرێ، ناردن، وەرێخستن و پێکهێنانی پێویستی رێگای،(ژا.، هەورا.) کیاسەی، کیاستەی، (لو.، فە.، کەل.) کل کردن، (کەل.، زەن.) کیاندن.

**بەریما** (باک.): بنجی، بنگەهی، بنیادینی، بنچینەیی، نەژادی.

**بەرین:** پان (دەر.)، پێن، ئاوەژووی تەسک، (هەورا.) پێشوو، بەرگ، بەرگین.

**بەرینیی:** پانایی، (دەر.) پێنایی.

**بەرینە:** پێشوو.

**بەرینک** (بار.): گیرفان.

**بەرینی:** بەرینایی، پانایی، پێنایی.

**بەرێوە:** بەرێگادا ڕۆیشتن، برێڤە، بەرێگایەدا.

**بەرێوەبەر:** ڕابەر.

**بەرێوەبردن:** سەرپەرشتی و چاوەدێری چتێک. بەخێو و پەروەردەکردن.

**بەرێوەچوون:** بەرێگایەدا ڕۆیشتن. بەخێوبوون، گوزەرانکردن.

**بەرێوجێ:** پوخت، کردار یا ووتووێژێکە لەجێی خۆی بێ.

**بەرێو شووێن:** بەرێ و جێ.

**بەز:** وەز، پیو، چەوری نێوزگی ووڵاغ و ئاژاڵانە بێجگە لە دووگ. (باک.) بەز، غار، بەغار و بەغاردان و بەزین، بەزاقی هەسپی خووەشە؛ غاردانی ئەو ئەسپەی خۆشە.

**بەزا:** ئەو کەسەیە یا چتەیە، کە زۆر دەبەزی، خۆشبەز، غاردەر، لنگدەر. هاوزێ، هەوتەمەن.

**بەزات:** ئازا، زاتدار، (باک.) بدەک.

**بەزاج** (باک.): نەکێشی، سەرپێچی، (باک.) لامۆفەک، فێڵبازی، ساختە چێتی فریودان.

**بەزاجکەر:** دووزمان، ئاوری بنکایە.

**بەزاخ** (رۆژ.): ئازا، بەکار، جووامێر.

**بەزاز:** کووتاڵ فرۆش.

**بەزقیت** (باک.): لەقەم، رەخنەگرتن.

**بەزان:** بەزین، (کە.) گاربوون.

**بەزاندن** (باک.): غاربێدان، راپێکردن، بەزانن. کۆڵ پێدان، شکاندن، بەسەردا زاڵبوون، بۆردان، گاردان، حیزنای، دابین کردن، زەبوونکردن. هاتنە دەرەوەی میزی منداڵە بە چەشنێکی وا، کە ناوڵانکەکە تەڕ بکات.

**بەزاوبوون:** لابردنی پەردەی کچێنی بووک لەلایەن زاواوە. *

**بەزە** (باک.): سووچ، تاوان، (زا.) گوناهبار، بەهەڵەچوو، (ئەردە.) خۆزگە، بریا، بری.

**بەزەتاو:** چەورکردنی شووێنێکی قەڵەشاوە یا سووتاوە لە ئەندام بە بەزی داخکراو، کە لەناو پەڕۆدا بە ئاگر گەرم و داغ دەکرێ ئەوسا لە شووێنە قەڵشاوەکە دەدرێ.

**بەزەرەک:** گیایەکی دەستچینە تۆوەکەی لەسەر بریان دادەنرێ دەری دەکات.

**بەزەک** (باک.): زەردی.

**بەزەکەر** (باک.): گوناهکار، سووچدار.

**بەزەوەزۆ** (خۆ.): بەزاوزۆ، گیانلەبەرێکی مێینەیە، کە زۆر بزێ.

**بەزەوی:** دڵسۆزی.

**بەزەویاچوون:** بەزەویدا ڕۆچوون و چوونە خووارەوە.

**بەزەوی پیاهاتنەوە:** بەزەیی پێداهاتنەوە.

**بەزەوی یادان:** بەزەوی دادان، ڕاخستن.

**بەزەویاکوتانن:** بەزەوی دادان، ڕاخستن.

**بەزەیی:** دڵنەرمی، میهرەبانی. سووێ. بە ــ: میهرەبان، دڵنەرم، پیار، بەزەیی دار، دڵسووتان بە کەسێکی لە کاتی کزی، نەخۆشی یا لێ قەومانێدا. بێ ــ: دلهشک، نامیهرەبان، دڵڕەق. بێ ــ یەتی:

دلەشکی، نامیهرەبانی، دڵڕەقێتی. ـــ پێداهاتن: دڵ پێ سووتان، دڵ بۆنەرم بوون، شایانی ـــ : (باک.) تۆناک.

**بەزەیی پێداهاتنەوە:** بەزەوی پیاهاتنەوە.

**بەزەیی دار:** بەبەزەیی، میهرەبان، پیار، دەڤترک، دلۆڤان. ـــ ی: میهرەبانی، دڵنەرمی، دلۆڤانی.

**بەزتن** (ئەردە.): بەزین، بارخستن لە شوێنێکی.

**بەزچاو:** گۆشتێکی زیادە بە پەلکی چاوەوە.

**بەزدار:** تێربەز، قەڵەو.

**بەزدۆک** (باک.): بازگە، جێگای بازدانە لە ئاوێدا.

**بەزدۆنەک** (باک.): ترسەنۆک. (باک.) ـــ ی: ترسەنۆکی.

**بەزدین** (باک.): ترسان.

**بەزر** (باک.): بزر، وون.

**بەزرەک** (ئەردە.): گیایەکە بەرێکی ووردی هەیە دەکوترێ و لە لەشی مرۆڤ دەنرێ تا ئازارێکی کە هەیەتی بیکێشی. تۆ کەتان.

**بەزرووتج:** گیایەکی هەمیشەییە گەڵای خڕ و وورد و بۆن خۆشی هەیە.

**بەزرک:** بزرۆک.

**بەزک** (باک.): قوماری پەرانتوویە.

**بەزکە:** ئارایش، لاولووسە، ڕازانەوە.

**بەزگەر** (لو.): تۆوچین، جووتیار.

**بەزل** (باک.): بەرانبەر، هەڤبەر.

**بەزم:** کەیف، زەماوەند، خۆشی، ئاهەنگ، گۆڤەن، گۆڤەند، لۆخانە، لووخان، جەفەنگ، ڕەزم، شادی، شەوق، شاهی، گۆڤەند، کۆڕ گرتنی تاکێک یا چەند کەسێکە، کە بە یاری یا جەفەنگ یان گۆرانی و مۆزیقا بەخۆشی ڕا بوێرن، هاو ـــ : هەم ئاهەنگ. کێشە، ڕووشە.

**بەزمان:** زارەکی، بە ووتە، بە زار، زمان ڕەوان، بە دەم وپل. *

**بەز مژک** (باد.): گەنە.

**بەزمساز:** بەزمگێڕ.

**بەزمشک** (باک.): بەدەم، بەدەم و پل، (باک.) بزمان.

**بەزمگا:** بەزمگە، شادیگە.

**بەزمگە:** بەزمگا، شوێنی بەزم و ڕەزمە.

**بەزمگێڕ:** بەزمساز.

**بەزم گێڕان:** گێڕانی بەزم وساز.

**بەزم و ڕەزم:** ئاهەنگ.

**بەزوبنێشت:** دەرمانێکە لە بەز و بنێشت دروستدەکرێ بۆ برین زۆر باشە.

**بەزۆرسەندن:** بە زۆر ئەستاندن.

**بەزۆک:** خۆشبەز، ئۆتۆمۆبیل.

**بەزۆکەوان:** خۆشبەزەوان. ئوتومۆبیلچی، شۆفێر.

**بەزی:** جوورە سابوونێکی لە بەز و قەڵیە دروست دەکرێ.

**بەزیان:** ترازان، شکان. کۆڵدان لە کارێکا.

**بەزێن:** جوورە یارییەکی منداڵانە جەغزێکی خڕەکێشن یەکێک دەچێتە ناریەوە ئەمانی تریش تێی هەڵدەدەن.

**بەزین:** غاردان، ڕاکردن، لنگدان، لینگدان، هەڵاکردن، ڕەوین. تێشکان، بەرگەنەگرتن، بۆڕخواردن، شکان، دابڕین بوون، گاربوون، قڕبوون، کۆڵدان، (ڕۆژ.) بەزان، دانەواندن، بەرانبەری نەکردن، بۆڕبوون. (خۆ.) ڕەوینەوەی دژخین، ترازیان. خستنی ماڵ و کۆچ لە شوێنێک، چادر هەڵدان. پەڕینی وولاٚخە بەرزە.

**بەزیو:** تێشکاو، بۆڕخواردوو. ـــ ی: تێشکاوی، بۆڕخواردوویی.

**بەژ:** زەوی، ووشکانی بەرواژی زەریایە. (باک.) زەوی دێم. شیناییکە بێ ئاوی کێشابێ.

**بەژا:** هاوتەمەن.

**بەژاف** (باک.): زەوی دێم و بێ ئاو.

**بەژاڤێت** (باک.): ڕەخنەگرتن.

**بەژەوەند** (کۆ.): پەسند. ـــ کردن: پەسندکردن.

**بەژڤین** (باک.): ووردەی چتێکییە بە هۆی ئەوەوە، کە چتێکی قورسی بە سەردا کەوتبێ شکابێ.

**بەژک** (باک.): ووشکانی، دێمەکار. ناڕێک.

**بەژمنێر:** بەشکۆ، خاوەند شکۆ. ـــ ی: بەشکۆیی.

**بەژمێر** (باک.): شایان. ـــ ی: شایانێتی.

**بەژن:** بالاٚ، قەد، ئەندام، تمتێل، (باک.) ئاڤکێل. ـــ و بالاٚ: قەد و بالاٚ.

**بەژن شووش:** ئەندام ڕێک و شووش و باریک، دەستە.

**بەژنەووت:** کورتەبالاٚ.

**بەژۆک** (باک.): زۆر بڵێ، (باد.) پرپێژ.

**بەژی:** ووشکانی، زەوی، ئیشکایی.

**بەژێرادان:** بەرزکردنەوە.

**بەژێرچاوەوە ڕووانین:** لە ژێرچاوەوە ڕووانین.

**بەژێرلێوانەوە:** بەنهێنی، بەپەنهانی. ـــ کردن: شاردنەوەی ووتە و لە ناو زاردا گلماندنی.

**بەژیی** (باک.): زەوی نەچێنراو. زەوییەکی دێمە، کە کشتوکاڵی تێدا بکرێ.

**بەس:** تێرا، هەند. ـــ بوون: تێرابوون، تێ هەڵێنان. تەنها بەس چووار کەس بوون: تەنها چووار کەس بوون. پەنا، پەسیو، چارە، وەکوو مەحوی دەڵێ:

بە خۆ کوژتن نەجاتی خۆت بدە مەحوی وەکوو فەرهاد
لە زۆری قارەمانی عیشق ئەفەندم هەر ئەجەل بەستە

(باک.) کۆتایی. ـــ کرن: کۆتاکردن، بڕاندنەوە. گرێ، بەستن.

**بەسات:** پێویستی: ئەوا ئێمە سبەینێ بەرە و سابلاٚخ دەڕژێنەوە تۆ هەرچی بەساتی هەیە ڕێکیخە واتە پێویستییەکانی.

**بەساڵداچوو:** پیر.

**بەساڵداچوون:** پیربوون، گەیشتنە سنووری پیری.

**بەسام:** سامدار.

**بەسە:** وازیێنە، تێرایە، هەندە. گۆرانی بەستە، بەستە چتێکی، کە پێکەوە بەسترابن، باقە، دەسکەگوڵ یا گیا، بەند، خزم، کەس، کەس و کار، بەستە، هەڵبەست، مەبەست، واتا.

**بەسەرهەو:** سەلەم، (شار.) ڕوبێدە. ــ دان: سەلەم کردن.

**بەسەراچوون:** لەبیرچوون، لێ تێکچوون. سەرلێ شێوان، وازلێ هێنان، هەڵبوواردن، ڕابردن، لەسەر چوون، تێپەڕین. چوونی یەکێک بەسەر یەکێکی ترا لەکاتی کار یا کردارێکیدا.

**بەسەرادان:** بەسەردادان، لە ناکاو چوونە سەر یەکێک.

**بەسەراهاتن:** بەسەرداهاتن، ئامۆژگاری کردن، هاتنی یەکێک بەسەر کەسێکی تردا لە کاتی کار یا گوفتارێکیدا. کارەسات و گێچەڵ بەسەرداهاتن.

**بەسەرەچوون:** بە بێ تۆڵە ئەستاندنەوە مانەوە وەکوو دەڵێن بەسەریەوە ناچێ واتا نابێ هەروا بە بێ تۆڵە و سزا لێ ئەستاندنەوە بمێنێتەوە.

**بەسەرەوەڕۆیین:** سەرەنگرێ بوون.

**بەسەرەوەگەڕان:** مووشەکردن، خۆبەخێوکردن بەم و بەو: فیسارەکەس هەر بەسەرەوە دەگەڕێ.

**بەسەرەوەگرتن:** گرتنی پیاوێکی بێگانە بەسەر ژنێکەوە.

**بەسەربردن:** کات بردنە سەر هەر چۆنێک بێ، بەجێ هێنان، بردنە سەرو ئەنجامدانی کارێک بە هەر جوورێکی بێ، پێکهێنان.

**بەسەرچوون:** بڕانەوەی کاتی چت، تێ پەڕین، بەسەر چوو واتا کاتی تێپەڕی. ناو هاتنەوەی گیاندار: فیسارەکەس بەسەرچوو: واتا ناوی هاتەوە.

**بەسەردابڕین:** چتێک لە لایەن فرۆشیارێکەوە بەزۆری بە نرخێکی زۆر و یا سەرەڕای بێ کەڵکی و کەموکووڕی دان بەکەسێکی. کێشە و ڕووشە و گێچەڵێک بە ملی کەسێکیدا بڕین. ئافرەتێک، کە بە زۆر خۆی بەسەر پیاوێکیدا ببڕێ.

**بەسەردادان:** لەناکاو چوونەسەر یەکێک.

**بەسەرداهاتن:** ئامۆژگاری کردن، هەڵشێلان. تووشی ڕووشە و کێشەهاتن. ــ ی شەو: ڕۆژ ناوابوون و شەوهاتن.

**بەسەرڕۆیشتن:** ئامۆژگاری کردن، هەڵشێلان، سەرزەنش کردن.

**بەسەرکردنەوە:** سەردان، لە هەواڵ و بارپرسین. لێ پێچانەوە، لێ تۆژینەوە، تاقی کردنەوە، بەسەر کەم و کووڕی ڕاگەیشتن، پێکەوتن، ڕێکەوتن، منەکردن، بەدی هێنان.

**بەسەرگرتنەوە:** وولاخ یا ئاژاڵ و چتێکی تری دزراوە، کە بدۆزرێتەوە، بەسەر گرتنەوەی پێدەڵێن، دیتنەوە، دۆزینەوە. تێهەڵچوونەوە لە کردار یا گوفتارێک لە نووکەوە بۆ تەواوکردنی وەکوو دەڵێن: قسەکە یا کارەکەم بەسەر گرتەوە.

**بەسەرگێڕان:** سەر لێ تێکدان و خەریک کردنی یەکێک وەکوو: بەسەم بەسەر بگێڕە.

**بەسەر و بەر:** پوخت، ڕێک و پێک.

**بەسەرهات:** سەرهات، بەسەرهاتی، (باک.) بەسەرڤەهاتی، سەربهوورد، سەربردە، سەرگۆت. هەنگامە، کارەسات، گۆنگەڵ، گێچەڵ.

**بەسەرهاتن:** ڕوودان، دووچاربوون، لەناوچاونووسران، خۆشی یا ناخۆشی بەسەرهاتن.

**بەسەرهەڵبوون:** بەسەرکردنەوە، چتی وون و بزر دۆزینەوە.

**بەسەری:** بەدروستی.

**بەسەریەکداچوون:** چتێکە تێکەڵ بەچتێکی تر بێ. بەسەر دەست تێکەڵاوی ژن و پیاوێکیدا چوون.

**بەسەرینی:** لەسەردەمی. ــ من: لەسەردەمی ژیانی مندا.

**بەسەزمان:** بەستەزمان، لێقەوماو، بێچارە، هەژار.

**بەسەزمانی:** بەستەزمانی، لێ قەوماوی، هەژاری، بێچارەیی.

**بەسەزووان:** بڕوانە: بەسەزمان.

**بەسەزووانی:** بڕوانە: بەسەزمانی.

**بەسەڵەک:** بەستەڵەک.

**بەستەڵەک:** بەسەڵەک، بەستوو، تەزیو، چیاو، ڕچیاو، (زەن.) ماسیان، (هەورا.) یەخ بەنان، شەختە، سەهۆڵبەندان.

**بەسبێژ** (باک.): زۆر بڵێ، چەنەباز.

**بەست:** ١) چۆم، ڕووبار، خڕ، کەند. ٢) خڕەجاڕ، خڕەلان، (هەورا.) دەستە، شیوی ناو لێ بڕاو، ئەواڵێکی بچووکە جارجارە ئاوی پێدا دەچێ. ٣) (هەو.) تەرم، بەستی. ٤) بەرهەڵست. ٥) شوورێنێکی پیرۆزی وایە، کە ئەگەر گوناهکارێک خۆی بگەیەنێتێ ئیتر کەس ناتووانی دەستی بۆ درێژ بکات.

**بەستام:** ناوی خاڵی ئەردەشێری بابەکانە.

**بەستە:** پاکەت، پێچۆک، بەستراو، تاخە، دەست پێچک، مەلالە. ــ ی چت: ڕەهەل، قەفە، چەند چتێکن پێکەوە بەسترابن. بەندیواری، لەمەڕ، بەستراوەوە. چەشنە گۆرانییێکی سووکەڵەو کورت و خۆش و لەبارە. دەرە، کەند. (باک.) جوورە گۆزەرییەکە. جوورە هەڵبەستێکی کورتە بۆگۆرانی. (باک.) بێ ترس، بێ باک.

**بەستەزمان:** بەسەزمان، کەرەواڵە، لێ قەوماو، هەژار. ــ ی: بەسەزمانی، کەرەواڵەیی، هەژاری، لێ قەوماوی.

**بەستەک:** (زا.) دەنگ. (خۆ.) ئاکارێکە بەو چەشنە: بارێکی بەستراو کە گوریسەکەی خاو بووبێتەوە نایکەنەوە بۆ توندکردنەوەی بەڵکوو پارچە دارێکی لە قەفی گوریسەکەی دەنێن و بایدەدەن تا توند دەبێ ئەو جار سەری دارەکەی وەبن لۆی گوریسەکەی دەدەن. دەستە نوورێنێکی پێچراو و بەستراوە لە ناو چتێکیدا. (باک.) تا، لابار، فەردە، لنگەبار. (دەر.) شوولک (هی دارە بی و نیتر).

**بەستەکار:** ڕێکخەر، دانەر.

**بەستەکاری:** ڕێکخستن، دانان.

**بەستەگی:** پەیوەندی، بەندیواری.

**بەستەڵە:** بەستەڵۆک.

**بەستەڵەک:** دۆندرمە. بڕوانە: بەستەڵۆک.

**بەستەڵۆک:** شوورێنێکە سەهۆڵی زۆر تێدا بەستبێ لەبەر ساردی.

**بەستەم** (باک.): ئەستی و بەردە.

**بەستەنی:** دۆندرمە.

**بەستەوانی** (ڕەوا.): میزگیران.

**بەستر** (باک.): پارچە قوماشێکی کوردییە.

**بەستران:** پێچدران، پێچ خوواردن، گرێدران. بوونە سەهۆڵ، (باک.) تلوونج. مەیین. ــ ی دەرک و پەنجەرە و نیتر: داخران، پێوەدران. لە

ترسان ـــ : جڤنین. ـــ ی پیاوێک لە چوونە لای خێزانی لەبەر سام یا چتێکی پووچی تر.

**بەستراو:** بادراو، پێچ خوواردوو، گەڕاوە بەسەهۆڵ. مەییو. پێوەدراو.

**بەستن:** پێچان، پێچانەوە، جەرد، ڕادان، بێندن، نژاندن، گرێدان بۆ پێچ و مێزەر و هەموو چتێک. (سوور.) بار ـــ : بارپێنین، بێنانەوە، بێناندنەوە، بۆبار و لابار و گەسک و گەلێ چتی تر. ـــ ی ئاو: بوونە سەهۆڵ، ڕچیان، قەرسین، قەرساندن. مەیین. دەرکە ـــ : پێوەدان، داخستن. کەڵەکە ـــ : گرد و کۆ بوونەوە، خڕبوونەوە سەریەکتری. پەکخستنی پیاو لە جووت بوونی لەگەڵ ژنی خۆی. بەستنی ڕێگا، بەستنی برین. کوتن، نووسین، دروستکردن.

**بەستنەوە:** گرێدان، پەتکردن، بەستنی گیاندارێک بە بەن و چتی تر، پەت لە دەست یا پێ یا ملی وولاغ و مالاّت و ئاژالاّن کردن، پێچانەوە.

**بەستوو:** بەستراو، مەیوو، پلۆر. تەزیو، بەستەڵەک، چیاو، ڕچیاو، سڕ، بێ هەست، چیو، کوویەڵەی شین. بستوو، بستی. دێزەوگۆزە و کوویەی ڕووکێش کراو. هەراسان، بەتەنگەوە.

**بەستۆرە:** ناوی ڕووبارێکی بە نێوبانگە لە نێوانی هەولێر و شەقلاّوەدا. خڕێکە هەمیشە ئاوی پێدا بڕوات یا نا.

**بەستوورک** (باک.): مل و ئێخەی کراسییە.

**بەستووک** (باک.): بەسکوورک.

**بەستی** (باک.): چاوتێر، فەریڤەت، بەقنیات. بارە کەوێکە فێری ڕاوی بکەن. کەنار ئاوی زیخماڵ. کوولەکە. جەنازە تەرم، بەست، بازە

**بەستێر:** قالّی، مافوورە.

**بەستێن** (موک.): ـــ ی چۆمی: کەناری ڕووبارییە، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی، کە بە زیخ و چەگڵ داپۆشراوە.

**بەسرپێرار:** (دەر.) پەستر پێرار، (باک.، شار.) بەترپێرار، پەسەر پێرار، (هەورا.) پەرەوترار، سێ ساڵ لەمەوپێش.

**بەسرپێرێ:** سێ ڕۆژ لەوە پێش، (دەر.) پەستر پێر، بەتر پێر، (باک.) بتر پێر.

**بەسروین:** پەنابردن، هانابردنەبەر.

**بەسزمان:** بەستەزمان.

**بەسزوان:** بەستەزمان.

**بەسفیە:** ڕەگی گیایەکی درێژ و باریک و گرێدارە و لە گرێیەکانی وی چەند ڕیشەیێکی باریکی پێوە هەلاّوە سراوە وەکوو هەزارپێ، لە نێو ڕەگی داران بە تایبەتی بەڕوو و لە ناو بەردانی کێوان دەڕوێ.

**بەسلەک** (ئەردە.): بەستەڵەک.

**بەسڵەک:** سەهۆڵ، سەهۆڵبەندان. بەستەنی، دۆندرمە، دۆڵدرمە.

**بەسۆ:** ناوی ئافرەتانە.

**بەسیی** (ئەردە.): کەسێکە، کە لە بەستا بێ. پەناهندە، هانابەر.

**بەسیاگ** (ئەردە.): بەستراو، بەستراوەوە. کەسێکە نەتوانێ بێێتە زاوا. پتەو، تات ژنێکە پەردەی کچێنییەتێکەی زۆر سفت بێ و پیاو نەتوانی لایبەرێ.

**بەسیاگەوە:** بەستراوەوە.

**بەسیان** (ئەردە.): بەستران، بەندبوون، گرێ خواردن، بەسترانی بازاڕ و کڕو فرۆشیاری.

**بەسیان بەیەکەوە:** پێکەوە بەسترانەوە.

**بەش:** بەهرە، پشک، پەش، (هەورا.) بەر، مل، بر، بژە، (بل.) مووچە، بیەش، بێش، پەیا، پار، (باک.) تا، پەیا، جوون، پەش، قەت، قسن، پارچەیەکە لە کۆما و کۆمەڵێکی. ـــ بوون: بەشکردن، پاربوون. ـــ کردن: دابەشکردن، پارکرن، پشک کرن، بەشینەوە، بەشکردن، قەتاندن، جۆخینەکە ـــ کردن: بڕکردن. ـــ براو: بێ بەش، بەشخوراو، بێ بەری، لێککراو. ـــ براوی: بێ بەشی، بەشخوراوی. ـــ دار: هاوبەش، ـــ داری: هاوبەشی. وولاغ، مالاّت، کەڵ یا گامێشێکە نێو چاوانی سپی بێ، (هەورا.) چار، قەش، قەشان، قەشقە، مارۆ. ئاوەڵە، کراوەوە بۆ زار پتر بەکاردەبرێ، زار، دەو ـــ کردنەوە: زار داچەقاندن، دەم ئاوەڵەکردن. ـــ بوون: ئاوەڵەبوون. ـــ کردن: ئاواڵە کردن. بێ ـــ: بارەنج، ڕەنج بە باچوو، بێ بەهرە، دامنە، بێ بەشکردن: بێ بەهرەکردن، ڕەنج بەبادادان. هێند، بەر، پارچەیەک. ـــ یکی بۆ هێنام: هێندێکی بۆ هێنام، نانەکەی ـــ یک کرد و بەشێکی ماوە: بەرێکی کردووە و بەرێکیشی ماوە. گیانداری ئاوچاوان سپی. کولۆلّی چارە ڕەش.

**بەشارەت:** هەست، جوولاّن، پاشەر، ووره، وره، زەهلە، زارە، بڕۆن. ـــ بەستران: ووره بەردان، پاشەرشکان.

**بەشافەند** (باک.): پاشبەند، سەروا.

**بەشاو:** بەشەناو، (ڕۆژ.) تاقاو.

**بەشاوەند** (باد.): پاشبەند، سەروا.

**بەشەناو:** بروانە: بەشاو.

**بەشەر:** دابەشەر، بەشکەر، بەشێن، دابڕ، دابەشکەر. مرۆڤ، ئادەمیزاد.

**بەشەن** (باک.): ئابیدە، پەیکەر. بەدەن، لەش، قەلاّفەت.

**بەشەنخووەش** (باک.): دڵکێش، دڵگر.

**بەشەنی:** لەشی، بەدەنی، ئابیدەیی، پەیکەری.

**بەشەوکردن:** بەشکردن، دابەشین.

**بەشبەر:** کەسێکە، کە لە میراتی مردوویەکیدا بەشدار بێ، خاوەند بەش.

**بەشبەش:** مووچەمووچە، پشک پشک.

**بەشبەشکردن:** مووچەمووچەکردن، پشک پشک کردن.

**بەشبراو:** بەشخوراو، بێ بەش، بێ بەری. دامنە، ولۆوڵ.

**بەشت** (باک.): کاریتەی خانووان.

**بەشخووا:** بەهرەی خووا، خوداداد. سەرفیترە، زەکات.

**بەشخوراو:** بەشبراو، بێ بەش، بێ بەری، لێک کراو.

**بەشخوراوی:** بێ بەشی.

**بەشدار:** هاوبەش، کاربرا، هاڤپا، هەڤا، هاوکار، کابرا، خاوەندبەش، بەشبەر.

**بەشدارەکی:** بەشداری، هەڤپایی.

**بەشداری:** بەشدارەکی، هەڤپایی.

**بەشقاندن:** دابین کردن، قایل کردن، ڕازی کردن.

**بەشقین:** دابین بوون، قایل بوون، ڕازی بوون، بیەششە: قایل بە

**بەشقم:** بەڵکوو، بەشکوو، بەشکم.

**بەشقی خووا:** بە عیشقی خودا.

**بەشکا:** بەشکم.

**بەشکایەکەم:** بەشکم.

**بەشکایەکوو:** بەشکم.

**بەشکە:** بەڵکوو.

**بەشکەر:** بەشەر، دابەشەر.

**بەشکەم:** بەڵکی، بەشقم، بەڵکوو.

**بەشکران:** فەلقین.

**بەشکراو:** (دەر.) بەشکریاو.

**بەشکردن:** (باک.) پارستن، فەلقاندن، دابەشین، دابەشکردنی چتێک بەسەر چەند کەسێکیدا، دابەشینەوە. تێرابوون، بەس، ئەمە بەشم دەکات: تێرای منە.

**بەشکریو**(دەر.): بەشکراو.

**بەشکم:** بەشکەم، بەشقەم، بەشقم، بەڵکوو، بەڵکی، بەقوو.

**بەشکۆ:** خاوەندشکۆ، (باک.) بەڕمنێر.

**بەشکوو:** بەشقم، بەڵکوو.

**بەشکۆیی:** (باک.) بەڕمنێری.

**بەشکی:** بەڵکوو.

**بەشگا:** دابەشگە، شوێنێکی تایبەتییە بۆ بەشکردنی ئاو، کە بۆ سەر کشتوکاڵ بچێ لە نۆبەی خۆیدا.

**بەشگە:** بەشگا.

**بەشۆ:** شۆدار، چتی شۆدار. (باک.) ناوی گای بەشە.

**بەشودار:** سابوونێکە زۆر کەفێ بکات.

**بەشوونارویین:** وەدووکەوتن، بەشوێندا ڕۆیشتن.

**بەشێن:** بەشەر، بەشکەر، بەشکار، دابەشەر، دابەشکار.

**بەشی خووا:** بەشی خودا، زەکات.

**بەشینەوە:** دابەشینەوەی چتێک بەسەر چەند کەسێکیدا بە خۆڕایی.

**بەعە:** زاراوەی منداڵانە بۆ مەڕو بزنانی بەکاردەبەن.

**بەعەج** (باد.): ترس.

**بەعەجی** (باد.): ترسەنۆک.

**بەعیجاندن** (زا.): ڕق هەڵستاندن.

**بەعیجین** (زا.): ڕق هەستان.

**بەعیف** (باک.): بادام، باوی.

**بەعیفتەڕ** (باد.): چووالە بادام.

**بەغچە** (باک.): باغچە.

**بەغمە** (ئەردە.): بوغمە.

**بەغدا:** نێوی شارێکی گەورە و پایتەختی عیراقییە لە پێش ئیسلامدا ساسانییەکان، کە فەیلین دایان مەزراندووە. ناوەکەش لە بنەڕەتدا کوردییە و باغی دادە چونکوو بۆ نەوشیرەوانی دادگەر دروست کراوە، تاقی کیسرا گرنگترین بەڵگەیە.

**بەغدووز:** کوردێک بووە لەگەڵ دەستەیێکی چوونە لای پێغەمبەری، پێغەمبەر، کە دیتی سامی لێ نیشت لە پێش هەموو کەسێکی لەوی پرسی تۆ چ کەسی؟ بەغدووز گوتی: من کوردم ئەوجار پێغەمبەر بێزوبۆی لێکرد و گوتی خوا بکا تەنها لە (شهادە) نەبێ لە هەموو چتێکیدا ڕێک نەکەون چونکوو ئەگەر ببنە یەک جیهانی وێران دەکەن. ئیتر نازانم ئەو دەنگ و باوە تا چ ڕادەیێکی ڕاستە.

**بەفاڵ:** بەتەڵەب، بەبا، (باک.) ئەلۆر، ماین، ماچە یا ماکەر کە ئارەزووی جووت بوونی بکەن. ـــ یان بۆ بەکاردەبری. ـــ ی: بەتەڵەبی، (باک.) ئەلۆری.

**بەفەڕ:** بەشان و شکۆ، بەکەڵک، بەپیت و فەڕ.

**بەفتاچوون** (ڕۆژ.): بەگژداچوون، شەڕ پێ فرۆشتن.

**بەفر:** بەرف، (باک.) ڤەوور، وەروە، (هەورا.) ڤەرڤە، (جا.، بابا.) بەوور، (فە.، دەر.، زەن.) وەفر، لە لای هەرکییان بەفر سێ جوورە و سێ ناوی هەیە: ١) کولی: بەفری کولوو گەورە. ٢) پش: بەفری کولوو وورد. ٣) گژ: گلێرە، بەفرئالووگە.

**بەفرالووگە** (هەورا.): گلێرە، گژ.

**بەفراو:** ئاوێکە بە بەفری سارد کرابێ.

**بەفرەبەسەر:** کورشە، (هەورا.) وەروەسەر، بەفرێکە کەم یا زۆر کەوتبێتە سەر یەکتری و لە بەرسارد و سڕی هەوا وای بەستبێ و ڕەقوهەڵاتبێ، کە مرۆ بەسەریدا بڕوات تێی نەکەوێ و زۆر جاری واش هەیە، کە هەرشوێنی پێشی دیار نابێ، ڕچە.

**بەفرەبوولکە:** (جا.، هەورا.): جوورە بەفرێکی زۆر وورد و ووشکە، هەرچەند بەدەست و پێی و بەرگەوە دەنووسێ بەڵان چونکوو ووشکە تەڕی ناکات. سەلاجە، ساردەر.

**بەفرە خۆرە:** بەفرێکی تەنک و سووکە لە بەهاراندا، کە بەسەر بەفریدا بباریێ دەیتوێنێتەوە. نێوی باڵندەیێکیشە.

**بەفرەخۆرکە:** باڵندەیێکە بەقەد بولبولێکییە دەنگی وەکوو بەفرەشینەیە، بەڵان لەوی گەورەترە. هەورێکی چڵکنە و تۆزی لێ دەبارێ دەبێ بە هۆی توانەوەی بەفر.

**بەفرەزێلکە:** بەفری وورد، (هەر.) پش.

**بەفرەسەر:** بەفر بەسەر، ڕچە.

**بەفرەشینە:** بەورەشینە، جوورە گرێ یا برینێکە وە مووی دەچێ دووای گەیشتنی نێرتکی دەردەکات و قونێرێکی زۆر پیسە. باڵندەیێکی شینە و جووانە بەقەد کۆترێکییە، (دەر.) جقەشینە، (موک.) کاسەڵە شینکە.

**بەفرەلوو:** بەفرماڵ.

**بەفرەلووکە:** بەفرالووگە، بەفرێکی دەنک ووردە لە تەرزە ووردترە.

**بەفرەمبار:** بەفرانبار، هەوەڵزستان، کانوونی پێشی، مانگی بەرایی زستانییە.

**بەفربەسەر:** کورشە، (هەورا.) وەروەسەر، بەفرێکە کەم یا زۆر کەوتبێتە سەر یەکتری و لەبەر ساردی و سڕی هەوا وای بەستبێ و ڕەق هەڵاتبێ، کە مرۆ بەسەریدا بڕوات تێی نەکەوێ و زۆر جاری واش هەیە، کە هەرشوێنی پێشی دیار نابێ، ڕچە.

**بەفرەبوولکە:** (جا.، هەورا.): جووره بەفرێکی زۆر وورد و ووشکە، هەرچەند بەدەست و پێی و بەرگەوە دەنووسێ بەڵان چونکوو ووشکە تەڕی ناکات. سەلاجە، ساردەر.

**بەفرە خۆرە:** بەفرێکی تەنک و سووکە لە بەهاراندا، کە بەسەر بەفریدا بباریێ دەیتوێنێتەوە. نێوی باڵندەیێکیشە.

**بەفرەخۆرکە:** باڵندەیێکە بەقەد بولبولێکییە دەنگی وەکوو بەفرەشینەیە، بەڵان لەوی گەورەترە. هەورێکی چڵکنە و تۆزی لێ دەبارێ دەبێ بە هۆی توانەوەی بەفر.

**بەفرەژیلکە:** بەفری وورد، (هەر.) پش.

**بەفرەسەر:** بەفر بەسەر، ڕچە.

**بەفرەشینە:** بەورەشینە، جووره گرێ یا برینێکە وە مووی دەچێ دووای گەیشتنی نێرتکی دەردەکات و قونێرێکی زۆر پیسە. باڵندەیێکی شینە و جوانە بەقەد کۆترێکییە، (دەر.) جقەشینە، (موک.) کاسەڵە شینکە.

**بەفرەلوو:** بەفرماڵ.

**بەفرەلووکە:** بەفراڵووگە، بەفرێکی دەنک ووردە لە تەرزە ووردترە.

**بەفرەمبار:** بەفرانبار، هەوەڵزستان، کانونی پێشی، مانگی بەرایی زستانێیە.

**بەفربەسەر:** کورشە، (هەورا.) وەروەسەر، بەفرێکە کەم یا زۆر کەوتبێتە سەر یەکتری و لەبەر ساردی و سڕی هەوا وای بەستبێ و ڕەق هەڵاتبێ، کە مرۆ بەسەریدا بڕوات تێی نەکەوێ و زۆر جاری واش هەیە، کە هەرشووێنی پێشی دیار نابێ، ڕچە.

**بەفرخۆرە:** جۆخۆرکە.

**بەفرخۆرکە:** جووره بەفرێکی زۆر وورده و خڕە هەر چەند لە بەهاراندا بباری بەفری دەتووێنێتەوە، بەفرخۆرە.

**بەفردەسی:** بەفری دەسکار.

**بەفرفرۆش:** بەرف فرۆش، کەسێکە بەفری بفرۆشێ.

**بەفرماڵ** (خۆ.، ڕەوا.): بەفرەلوو، وەروەرەی بەفری، بێڵ.

**بەفروپشۆ** (شار.): شڵێوە.

**بەفرۆک:** نێوی ئافرەتانە.

**بەفریک** (سوور.): (باد.) زۆزانیک، بەفریکار، بەفر خەرەوە، سیپە، سەهۆڵکار، سەهۆڵدان، سەهۆڵخانە.

**بەفرینە:** حەلاوێ، دۆڵدرمە، شیر و شەکر و بەفر.

**بەفش:** شانە، شە، مرازێکە لە کەرەستەی تەونیدا بەرەی پێ پاک دەکرێتەوە.

**بەفشک**(باک.): گەردنی پێیە (لای هەرە باریکاییەکەی خووارەوەی لوولاکی پێیە). مەچەک، زەند. پازەند، باریکاییەکەی باسکییە لە نزیک دەستی، بەفشی بچکۆڵە.

**بەفر** (باد.): بیوور. (باک.) بەور لە پڵنگی بەهێزتر و گەورەترە.

**بەقل** (باد.): هاوپایە، هاوشان، هاوزێ. بەور، بەبر (دڕندە).

**بەق** (باک.): بۆق، شاقرداق، زەق. ـــ کرن: زەق کردنەوەی چاو، (هەورا.) کەوی نێر، نێرەکەو، پاداو.

**بەقا:** باوەڕی، بڕوا، باوەڕ، بایەخ. ـــ کردن: باوەڕکردن.

**بەقادار:** بایەخدار. ـــ ی: بایەخداری.

**بەقاڵ:** دێوەرە، چەرچی، تەڕەفرۆش، میوە فرۆش. ـــ ی: دێوەرەیی، چەرچێتی، تەڕە فرۆشی، میوە فرۆشی.

بەقانامە

**بەقانامە:** بڕوانامە، باوەڕنامە، (باک.) باوەرۆک.

**بەقەد:** هێندە، بەرتەقا، بارتەقا.

**بەقەری:** جووره ترێیەکە.

**بەقەم:** دارێکی بڵند و ئەستوورە گەڵای وەهی بادامی دەچێ گوڵی ووردە و بەرەکەشی خڕ و سوورە و دارەکەشی سوورە، بە وی خوری و لۆکە ی ڕەنگ دەکەن، بەرقەم، جووره ڕەنگێکی سوورە.

**بەقەمۆک** (باد.): دەرمانێکی تۆزی سووری چارانە.

**بەقبەقوو:** گرمە، گرمەگرم، گرماندن.

**بەقبەقۆک** (باک.): بڵقەبڵقی ئاوێیە.

**بەقبەقی** (باد.): گۆزەڵەی بێ دەسک و لوولەیە. بڵقەبڵق، دەنگی ئاوی، کە لە شەربە یا لوولینە و تونگە و ئیتر بێتەدەرێ. کانییەکیش ئاوی لێ هەڵقوڵێ ـ دەکات.

**بەقتاندن:** تەقاندن.

**بەقک** (باک.): بۆقی گچکەیە.

**بەقلە** (ئەردە.): قەلەموونە.

**بەقلەموون** (ئەردە.): قەلەموونە، قەل.

بەقلەموون

**بەقلەوا** (زا.): پاقلاوە.

**بەقلیسۆک** (باک.): بێ شەرم، ڕووداماڵراو، بێ ئابڕوو.

**بەقم** (باک.): تێکچوو، گۆڕاو، خراو، خراپ (بۆ ڕەنگ).

**بەقنگاخستن:** دوواخستن و خستنە پشت گووێی کارێک.

**بەقنگەوەخستنەکەندەلان:** بڕێتییە لە دەمدانەوەی یەکێک.

**بەقنگەوەکەفتن:** بەقوونەوەکەوتن، کەوتنەسەر پشت.

**بەقیە:** باقیە.

**بەقیناکەوتن:** ڕق هەستان ومانەوەی لەسەر ئەو چتەی، کە ڕقی لەسەر هەڵگرتووە.

**بەکار:** کاربین، وەکار، وووریا، زیرەک، لێهاتوو. ـــ بران: هلهلین. ـــ بردن: هلهلاندن. ـــ ئاما (هەورا.): بەکاربراو. ـــ ئامای(هەورا.): بەکار هاتن. ـــ خوواردن: بەکەلک هاتن.

**بەکارهاتن:** بەکەلک هاتن.

**بەکاری:** زۆر کارکەری.

**بەکام گەیشتن:** بەمەبەس گەیشتن.

**بەکام گەیین:** بەدڵخوواز گەیشتن.

**بەکەوەخۆ:** ئارام، هێمن، هێدی، لەسەرەخۆ، (باک.) هێدیکا، خووین سارد.

**بەکەش و قنگاهاتن:** تێهەڵکوتن، هەڵنان.

**بەکەڵ:** بۆ مانگا یا گامێشێک بەکار دەبرێ، کە ئارەزووی نێرەی خۆیان بکەن. ـــ بوون: وەبەر هاتن، هاتنەبەر.

**بەکەلک:** چتێکە سوودێکی لێ وەربگیردرێ. ــ هاتن: بەکارهاتن. ــ نەهاتن: بەکارنەخواردن، لەکارکەوتن.

**بەکەیف:** شاد، کەیفخۆش.

**بەکڕ:** کڕیار، بکڕ.

**بەکرەیی:** گۆرانییێکی تایبەتییە پاڵە لە کاتی دروێنە کردنێدا دەیڵێ.

**بەکربەگی** (باک.): جۆرە بووزووێکە.

**بەکرووک:** گێرە شێوێن، کەسێکە چاووڕاو لەم و لەو بکات.

**بەکۆ:** ناوی مرۆڤانە. بەکری چیرۆکی مەم و زینێیە.

**بەکێش:** مرۆڤێکە لە هەموو بارێکیدا پشوودرێژ و خۆڕاگربێ.

**بەگ:** بێگ، ئاغا، کەکۆ، گەورە، میر، هەخامەنشیەکان بە خولاێان دەکوت بەگ.

**بەگانە:** گەورانە، ئاغایانە. خەرج و باجێکە لە لایەن بەگانەوە خرا بووە سەر وەرزێر و ڕەنجبەران.

**بەگداشی:** بەکتاشی. (ڕێبازی) بەکتاشی.

**بەگزادە:** بەو کەسە دەڵێن، کە ڕۆڵە یا لە نەوە و نەتەوەی بەگان بێ.

**بەگزاپەڕین:** بەگژداچوون.

**بەگزاچوون:** بەگژداهاتن.

**بەگزاهاتن:** بەگژداچوون.

**بەگژداهاتن:** بەگژاهاتن، بەگژاچوون، بەگژاپەڕین، ئاوقەد بوونی چتێک بە چتێکی تر، ئازاد بەگژ باوکیدا چوو، مێوە کە بەگژ چنارەکەدا چوو: پێ هەڵگەڕا.

**بەگوڕ:** بەهێز، بەقین. بەتاڵووکە، بەپەلە.

**بەگۆشەی چاوەوە ڕوانین:** لە ڕووی ڕق و کینەوە یا نازەوە لە سیلەی چاوەوە تەماشاکردن.

**بەگون:** گوندار، گونک، قۆڕ. نێرێکە ئارەزووی پەڕینی زۆر بکات. وڵاغێکە نەخەسێنرابێ. بەدەمار، ئازا، بەزات، زاتدار، دەماردار، زەبەردەست.

**بەگووێ:** گوێگر، گوێدێر. ــ بوون: گوێدێربوون. ــ کردن: گوێدێری.

**بەگوێچکلان:** بەگوێ دادان، بەگوێ هەڵێنان.

**بەگوێچکاهاووردن:** بەگوێ هەڵێنان.

**بەگووێ دادان:** بەگوێ هەڵێنان.

**بەگووێ هەڵێنان:** لە پەنای بار و پەردەیەکیدا چتێک بەگوێی کەسێکی دادان.

**بەگێتی:** بەگیتی.

**بەگیر:** گیانلەبەرێکە لە بەرانبەر گێچەڵ و کارەساتی ڕۆژگاردا خۆی بگرێ.

**بەگیرکەوتن:** دەست کەوتن، هاتنەدەست.

**بەگیروەستان:** هاتنەژانی شووێنێک لە ئەندام.

**بەگیروێستان:** بەگیروەستان.

**بەگیرهاتن:** گیرۆدە بوونی گیاندارێک و دووچار بوونی بە چتێک.

**بەگیرهێنان:** دەستگیرکردن. زۆر هێنان بۆ گیاندارێک و تەنگاوکردنی.

**بەگیسی:** نێوی ئافرەتانە.

**بەل** (باک.): بزنێکە تووکی ڕاست ڕاوەستێ. ئاووسان، هەڵمسان. ــ بوون. ــ کردن: ئاووساندن، هەڵمساندن. قیت، ڕاست. بزنی گوێ لوول و نیوەقوتە و سپییە، کە گووێ شۆڕ نەبێ. چتێکە شۆڕ بووبێتەوە و تەکەتەکی بێ. جۆرێکە لە ڕەنگی بزن.

**بەڵا:** چەپۆک و کارەساتی ڕۆژگار، وەی، بەڵا، قەیدی نیە باوابێ. بڵاو، (باک.) بلاڤ.

**بەلاتە** (باک.): بەراتە.

**بەلاتینگ** (باک.): پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگی نێو شیناییانە.

**بەڵاجەوی:** قەشمەرچارۆ.

**بەلادا:** واتا بەلایەکیدا سا لای ڕاست یا چەپ، لای پێشەوە یا پشتەوە.

**بەلاداکەفتن:** بەلاداکەوتن.

**بەلاداکەوتن:** بەلادا کەفتن.

**بەلاداهاتن:** کەوتن، کەفتن، سللاربوونەوە، ڕەت بردن، درێژبوون، پاڵکەوتن، پاڵکەفتن، پاڵدانەوە، پاڵەوەدان. مردن لە پڕا، مەرگی لە ناکاو.

**بەلاشە:** جۆرە چنراوێکی هەرزانە دەکرێ بە کاڵا.

**بەلاڤ** (زا.، باک.): بڵاو، پەرت، وڵاو، (هەورا.) وەڵاو.

**بەلاڤی** (باک.): بڵاوی، پەرتی.

**بەلاکێتک** (باد.): چۆلەکەیەکە زیندەواری دەخوا.

**بەڵاگەردان:** قوربان، گۆری، بەڵاگێڕ، دەردەوگەڕێن، وەیەوگەڕێن. ــ ی باڵاتبم: بەدەوری باڵات دا گەڕێم، بەقوربانی باڵات بم.

**بەڵاگێڕ:** کەسێکە، کە خۆی بگێڕێ بە دەوری یەکێکیدا. خێرێکە بکرێ بۆ پێشگرتنی بەڵایەک.

**بەلالووک:** بەڵاڵووک.

**بەڵاڵووک:** ئاڵووباڵوو، (باک.) بەلالۆک، (هەورا.) بەڵاڵوێ. (هەو.) دارێکە بەقەدەر دارە گوڵێکی بڵندترە بەرەکەی وورده بەقەدەر نۆکێکییە ڕەنگی سوور یا ڕەش یان زەردە وەکوو گێلاسییە، کە بخورێ و ناوکەکەشی بکرۆژرێ بۆ کرم و ڕەوانیش دەڵێن زۆر باشە، (زا.) هەلهەلۆک.

**بەڵاڵوکی کێوی:** هەلالک، هەلالووک، هلالک.

**بەڵاڵووێ:** ئاڵووباڵوو.

**بەلالیزک** (باک.): جۆرە گوڵێکە.

**بەلالیسک:** جۆرە گوڵێکی بچکۆلانەیە.

**بەلام:** بەلان، بلام، تەنانەت، ئەمان، وەلێ.

**بەڵامەک:** بزمۆک، بزمەک، ئەوەیە کە لە دەمی کار و بەرخ و گوێلکان دەگیرێ بۆ ئەوەی، کە دایکیان نەمژن.

**بەلان** (ڕۆژ.): گورج و گۆل، توند و تۆڵ، چالاک، چەلەنگ.

**بەلان:** بەلام، بلام، بلان، لێ، (هەورا.) بەلێ.

**بەلاوە:** کلا، تەرخان، تایبەتی. ــ نان: واز لێ هێنان، بەجێ هێشتن، لێ گەڕان، وازلێ هاووردن، بێ هومێدبوون.

**بەڵاوەگیر:** بەڵاگێڕ، بەڵاگێڕەوە.

**بەڵە** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی درێژ و لوول و ڕاست ڕاوەستێ نەشۆڕ بێ و نەقیت. ئەم وشەیە لەگەڵ هەموو نیشانەکانیان بەکاردەبرێ، کە هەیانبێ تەنها لەگەڵ (کوور) و (کەرە)ی نەبێ.

**بەڵەباریکە:** مەردومی باریکی ڕەقەڵە.

**بەڵەبالـە:** ئازارێکی کوژندەیە تووشی مەڕو بزن و ماڵاتان دێ دەیکوژێ.

**بەڵەبەش** (هەر.): بزنێکە گوێی ڕاست و لوول ڕاوەستێ و لەشی ڕەش و نێوچاوانی سپییە.

**بەڵەبەڵ:** تەکەتەک، (باک.) گیانداری گووێ قوت.

**بەڵەبل** (ئەردە.): مەردومی زماندرێژ.

**بەڵەبۆر:** مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و درێژ و لوول و ڕاستبێ و سەر و هەموو لەشی بۆر بێ.

**بەڵەپا** (هەورا.): کەسێکە لە ڕۆیشتندا زۆر بەپێ و خێرابێ.

**بەڵەتاڵەبۆر** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و درێژ و لوول و ڕاوەستێ و چەند جغزێکی ڕەش یا سووری لە ڕووی دابێ و لەشی بۆربێ.

**بەڵەتاڵەڕەش بەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی درێژ و لوول و ڕاست ڕاوەستن و چەند جغزێکی شین یا سووری لە ڕووی بێ و لەشی ڕەش و پەڵەی سپی لە لەشیدا بێ و سەری ڕەشبێ.

**بەڵەتاڵەسۆر بەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی درێژ و لوول و ڕاست ڕاوەستی و چەند جغزێکی ڕەش یا سووری لە ڕوویدا بێ و لەشی سووربێ و چەند پەڵەیەکی سپی لە لەشیدا بێ.

**بەڵەتاڵەشین بۆر** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و درێژ و لوول ڕاوەستن چەند جغزێکی شین و سووری لە ڕووبێ و لەشی بۆربێ.

**بەڵەتاڵەشین ڕەش** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و درێژ و لوول ڕاوەستن و چەند جغزێکی شین یا سووری لە ڕووی بێ و لەشی ڕەش بێ.

**بەڵەتاڵەشینی سپی** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و درێژ و لوول ڕاوەستن و چەند جغزێکی شین و سووری لە ڕووی بێ و لەشی سپی.

**بەڵەتاڵەشینی سۆر** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و درێژ و لوول ڕاوەستن و چەند جغزێکی شین و سووری لە ڕووی بێ و لەشی سوور بێ.

**بەڵەتەبەش** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی درێژ و لوول و ڕاست ڕاوەستن لەشی سپی بێ و نوختە نوختەی ڕەش یا سووری پێوە بێ.

**بەڵەتەبەش بەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی قیت و لوول و ڕاست و درێژ ڕاوەستن، سەر و ملی نوختەنوختەی سوور یا ڕەشی پێوە بێ و لەشی سپی بێ و پەڵەی ڕەش یا سووری لە لەشیدا بێ.

**بەڵەتەی** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی درێژ و لوول و ڕاست ڕاوەستن و سەر و لەشی تەواو سپی بێ.

**بەڵەتەی بەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی درێژ و لوول و ڕاست ڕاوەستن و سەر و هەموو لەشی سپی بێ و پەڵەی لە لەشیدا بێ.

**بەڵەچەک:** (فە.) ئانیشک. کوولەکەی خوواردنێ بە پاککراوی و بە پارچەپارچەی درێژ و پان و تەنک ووشک دەکەنەوە بۆ چێشتی زستانێ، (بابا.) تاسمە. کوولەکەی پارچەپارچەیە لە نێو دۆشاویدا دەیکوڵێنن، جارجارەش هەرمێشی تێدەکەن. (وا.) مرەبا، رووب.

**بەڵەد:** شارەزا. ـــ بوون: وێڕاهاتن. نا ـــ: ناشی، ناشارەزا، بێ هونەر، لاجوور. ـــ ی: شارەزایی، خۆجێیی، جهزایی.

**بەڵەدیتی:** شارەزاییتی، جهزایی.

**بەڵەدی:** ڕووناکی، لاجوور، برووسکە.

**بەڵەڕەش** (هەر.): بزن، ماکار، یاگیسکێکە گوێیەکانی ڕاست و درێژ و لوول ڕاوەستێ و لەش و سەری ڕەش بێ.

**بەڵەڕەش بەش** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی ڕاست و درێژ و لوول ڕاوەستێ و لەشی ڕەش و نێوچاوانی سپی بێ.

**بەڵەڕسەر** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و لوول و درێژ ڕاوەستن، سەر و ڕووی ڕەش و ملی بۆر و لەشی سپی بێ.

**بەڵەڕسەربەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و لوول و درێژ ڕاوەستن و سەر و ملی بۆر و لەشی سپی بێ بەڵان خاڵی ڕەشی لە لەشیدا بێ.

**بەڵەڕسەرشین بەڵەک** (هەر.): مەڕێکە هەردووک گوێیەکانی ڕاست و لوول و درێژ ڕاوەستن ملی مەیلە و شین و سەر و ڕووی ڕەشبێ و لەشی سپی بێ و پەڵەی لە لەشیدا بێ.

**بەڵەزوواد:** ئاوزوونە.

**بەڵەزێ:** گوڵێکی کێوی و دەستچینە، گوڵەپەمۆ، گوڵی لەبان.

**بەڵەسان:** دارێکە ڕوونی بەلەسانی لێ دەگرن.

**بەڵەسە** (بابا.): سەرکێشی، یاخی، (موک.) ئاوارە.

**بەڵەسەبوون:** سەرکێشی، یاخیەتی. ئاوارەبوون. (کە.) مۆزکردن.

**بەڵەسەرڕەش** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و لوول و درێژ ڕاوەستن، سەر و ملی ڕەش و سپی بێ.

**بەڵەسەرڕەشبەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێی درێژ و لوول و ڕاست ڕاوەستێ سەری ڕەش و لەشی سپی بێ بەڵان پەڵەی ڕەشی لە لەشیدا بێ.

**بەڵەسپی** (هەر.): بزنێکە گوێی ڕاست و درێژ ڕاوەستن و لەش و سەری سپی بن.

**بەڵەسۆر** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی ڕاست و لوول ڕاوەستن و لەش و سەری سووربێ.

**بەڵەسۆربەش** (هەر.): بزنێکە گوێی ڕاست و لوول بێ و لەشی سوور و نێوچاوانی سپی بێ.

**بەڵەشووانە:** گیایەکی کوێستانییە گەڵایەکەی وەک گەڵای (بەن) وایە، بەڵام لاسکی باریکترە.

**بەڵەشین** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی ڕاست و لوول و درێژ بن و سەر و لەشی شین بێ.

**بەڵەشین بەش** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی ڕاست و لوول بن لەشی شین و نێوچاوانی سپی بێ.

**بەڵەشین بۆربەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێی درێژ و لوول و ڕاست بێ سەر گوێی شین و لەشی بۆربێ و پەڵەی لە لەشیدا بێ.

**بەڵەشین ڕەش بەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی درێژ و لوول و ڕاست ڕاوەستن سەرگوێی شین و لەشی ڕەش بێ و پەڵەی لە لەشیدا بێ.

**بەڵەشین سۆربەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی درێژ و لوول و ڕاستبێ سەری گوێی شین و لەشی سوور بێ و پەڵەی لە لەشیدا بێ.

**بەلەفیرە:** نەخۆشیەکە تووشی بزن و مەڕ و گای دەبێ دەفیرێنێ بەخۆیدا، لەوانەیە بیکوژێ. بەلەفیرێ.

**بەلەفیرێ:** بەلەفیرە.

**بەلەقوڵە** (هەر.): بزن یا گیسک یا کارێکە گوێیەکانی ڕەشبن و ڕاست ڕاوەستن.

**بەلەقوولەبەڵەک** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی ڕاست و قیت و لوول ڕاوەستن و سەرو ملی سوور و لەشی سپی بێ و پەڵەی ڕەش یا سووری لە لەشدا بێ.

**بەلەک** (هەر.): لەگەڵ هەموو نیشانەکانی مەڕان بەکاردەبرێت، جوورە گیایەکی بەرزی شیلەداری لاسک دارە گەڵای وەکوو بی وایە بەڵام بچووکترە بنکەکەی بۆ گەڵێک دەرمان دەشێ بەتایبەتی بۆ کۆکساکۆلاو پیپسی زۆر سوودی لێ دەبینن، (هەورا.، دەر.) پەوز، (رەوا.) بۆقی بەلەک، چۆقل، گۆشتی لوولاکییە، بۆقل، (باک.) پاق، (فە.) ساق، مەشکەلاق، مەشکە لوولاک، (باک.) بەلۆریناتک، (شار.) مێکووک گیایەکە، (باک.) بەڵەک. (باک.) ـــ ی بەلۆریناتک، (باک.) ـــ ێ گووری.

**بەڵەک:** تەبڵەق، شل، شلە، پڵپڵی، باز، بازگ، (جا.، بابا.) بازوو، بەلەک، پاق، (باک.) بۆقل، (هەورا.) بارە، باری، پنک پنک، پەڵەپەڵە، پنپنی، ڕەش و سپی، پوویز، (ڕۆژ.) بازبازکێ، دوو یا چەند ڕەنگی پەڵەپەڵەییە بە لەشەوە سا هەر ڕەنگیکی بن، وولاخ یا ئاژاڵێکە بەڵەکەتی هەبێ یا چەند دانەییکی لە نیشانەکانی پسپۆڕییەوە پێوەبێ.

**بەلەکار** (هەر.): بزن، کار یا گیسکێکە گوێیەکانی ڕاست ڕاوەستن تووکی سەری گوێچکەکانی زەرد بێ.

**بەلەکان:** ناوی تیرەیەکی کوردە لە ناوچەی سەعیرد.

**بەڵەک بەڵەک:** پڵپڵی، پڵنگی، بازگ.

**بەڵەک بردین** (باک.): قوماش و پارچەی بەڵەک بەڵەک و پەڵەپەلاوییە، چتی ڕەنگاوڕەنگ.

**بەڵەک بردینی** (باک.): بەڵەکی، نەخشکردن بە چەند ڕەنگێک.

**بەڵەک پێچ:** پووزپێچ، پووزەوانە، لاسکەگۆرەوی، پاپێچ، پێ پێچ.

**بەڵەکچاو:** کەسێکە ڕەشکێنەکەی زۆر ڕەش و سپێنەکەشی زۆر سپی بێ.

**بەڵەکناچێ:** پیاوی ژنانی.

**بەڵەکی:** بەڵەکێتی، بەلەکی، بەڵەک بوون، دەردێکە ئەندامی مرۆی پڵپڵ دەبێ، تیکوڵی ترنج و نارنج بە سووتاوی سبەینان قامکی لێدرێ و لە زاری بدرێ وە لە جێگایەکەشی هەڵبسووڕێ دەڵێن زۆر بەسوودە.

**بەلەگ:** مێکووک، (باک.) سەرمایە، شێوەی بەرگ پۆشین.

**بەلەگۆشک** (باک.): بەلبەگۆشک، کرکرۆچکەی گووێ.

**بەلەم:** کەشتی چکۆڵە، قایەغ.

**بەلەمرک** (فە.، خانە.): ئانیشک.

**بەلەمز** (خۆ.): ئاژاڵێکە دەم و لووتی سپی بێ و گوێی ڕاست ڕاوەستێ.

**بەلەنگاز** (باک.، زا.): بەدبەخت، هەژار، بێچارە، چارەڕەش، ژارۆ، پەرێشان، سواڵکەر.

**بەلەنگازی** (باک.): هەژاری، ژارۆیی.

**بەلەوبوون:** ڕاست و قیت بوونەوە، ڕەپ بوون.

**بەلەوچکە:** بەربۆسە، مرازێکە لە کەرەستەی جووتیدا.

**بەلبەلاسینگ** (ئاک.): پەپوولە.

بەلبەلاسینک

**بەلبەلەگۆشێ** (ئەردە.): مرۆی گووێ لەمست.

**بەلبەلیناتک:** بەلبەلیناتگ.

**بەلبەلیناتگ** (باک.): جوورە پەپوولەیەکە.

**بەلبەنی** (باد.، باک.): دژراخ (گیایەکە).

**بەلبوون** (باد.): بزووتن و بۆ پێشەوە چوون، بەلەوبوون.

**بەلت** (باک.): دەستەبەند، نۆبەدار، تەبەقەبەند. (باک.) ـــ ک: دەستەبەندی، تەبەقەبەندی، قەفەسەبەندی.

**بەلچم** (باک.): پەڕی گوڵی، گەڵای دار.

بەلچم

**بەلچیقا:** بەلژیک. ـــ ی: بەلژیکی.

**بەڵخ:** توویژێکە بە بەردی ناو ئاو یا کەناری حەوزانەوە دەبینرێ، (بابا.) بێخ، جوورە جلکێکە بە هۆی تەڕییەوە لە هێندێ چت پەیدا دەبێ. سەر تووێی سرکەو ئاوی قوڕە و مەی و چتی تر.

**بەڵخە** (ئەردە.): یەکانە.

**بەلخ کوچک:** گلەوەرزە.

**بەڵخی:** بەڵخە، یەکانە، جوورە بەرازێکی نێرە، کە بەتاکە بووبێ لە دایک و لە ساواییدا شیری تەواو خواردبێ ڕەنگی بۆز و بێ تووکەو لە زۆر بەرازە یەکانەکانی تر گەورەترە پێستی ئەوەندە قایمە گۆیا هەموو گوللەییێک نایبڕێ.

**بەلشاندن** (باک.): هاندان.

**بەلشێن** (باک.): نزا، شەڕوکێش کردن، بەگژداچوون، قینەبەری کردن.

**بەڵغ:** کەرەکیفە، کەرەداڵ، بوغ (بۆ ژەنگی مسی)، بەر بۆسەماوەر، (هەورا.) بەڵخ. ـــ ی لێووزمان: باری لێووزمان، (هەورا) بەڵخوسەر و زووانی.

**بەڵغەم:** ئەو تف و چڵکە توندەیە، کە لەسینگ و گەروو و زاردا دێتەدەرەوە، مڵتەیەکە لە دەروونەوە دێتە ناودەم. دەردێکی کوژندەیە. جوورە برینێکە لە دەست یا لاق دێت، کە بخورێنرێ ئاوی زەردی لێدێ.

**بەلقاندن** (باک.): بلقدان، قەلبەزین، دەرپەڕین، هەڵقولین؛ بیەڵقینە.

**بەلقەتین** (باک.): قەڵشان، پارچەپارچەکردن.

**بەلقتاندن** (باک.): قەلاشتن، پارچەپارچەکردن.

**بەلقتین** (باد.): بەرقتین.

**بەلقران** (باک.): گیایەکە.

**بەلک** (باک.): گەڵا، پەلک. ـــ ا گوھ: بەڵگەی گوێ، بەڵگەرگۆش.
بەرگ، جلک. ریش سپی و گەورەی ئاوایی و هۆز.

**بەڵک:** گەڵا و پەلکی داران، بەڵکوو، بەڵکی.

**بەڵکا:** بەڵکوو.

**بەلکانک** (باک.): جوورە باڵندەییێکە.

**بەلکە:** بەڵکە.

**بەڵکە:** بەلکە، بەڵکوو، بەڵکی، بەڵکم، بەڵکۆ، بەشکوو، (ئەردە.) جوورەگیایەکە.

**بەڵکەم:** بەڵکوو.

**بەڵکم:** بەڵکوو.

**بەڵکوو:** بەڵکی، بەڵکە، بەلکم، (باک.) قەمی، بەڵکۆ، (باک.) تەڤور، بەشقم، بەچکم، بەچکوو.

**بەڵکی:** بەڵکوو.

**بەلگ:** بەڵغ، (باک.) بەلەگ، گەڵا، پەلکی گوڵ، مێکورک، قەڵافەت، شێوەی مەردوم.

**بەڵگ** (ئەردە.): بەرگ، گەڵا، پێلووی چاو.

**بەڵگە:** دەستاوێژ، ڕابەر، ڕێ نیشاندەر، نیشانە، لەکەل و پەلێکی دزراو یا گوم بوو ئەگەر پارچەیێک بدۆزرێتەوە ـــ ی پێ دەڵێن. ـــ ی گوێ: گۆشتە نەرمەکەی خوارەوەی گوێچک، چیچکە، شلکەی گوێ، (هەورا.) چیچیلە، بەڵکەوگۆشی، (هەورا.) چیلک، (کۆ.) چیلچیلە، (فە.) تکی گوش، بەلکا گوه.

**بەڵگ چاو:** پیڵوو، پیڵە، پەلە، پەڵک.

**بەڵگ سیمن** (هەر.): گیایەکە لە نێو ژاژی دەکرێ.

**بەڵگ گوێچکە:** بەڵگەی گوێ، نەرمەی گوێ.

**بەڵگ لووت:** نەرمەی لووت.

**بەڵگوین:** سەروین، لە ناوبردنی چت: ماڵەکەی ـــ کرد واتە سەروین کرد.

**بەلگە:** بەرگ، سەرمایە.

**بەلل** (باک.): ڕەخنەگرتن، (باک.) بەژاڤیت.

**بەڵم:** کابرنج، لاسکی چەڵتووک و مەرەزە، کە نەکوترابێ. پەڵپ.

**بەڵمەپر:** تفەنگێکە لە قوونەوە دابگیرێتەوە. قەوانە فیشەکی وایە تەنها بارووت و تەرەقەی تێدابێ و گوللەی تێدا نەبێ بۆ ڕاوە چۆلەکە لە کاتێکیدا، کە بەسەر مەرەزەدا بدات.

**بەڵمەریشە:** پیاوێکە ڕیشێکی گەورەی گڤی بێ.

**بەڵمی:** وەڵامی پێدەدرێتەوە لەکاتی ڕق و پەشم و کیندا.

**بەلوو** (هەورا.): بەڕوو.

**بەلووەر** (باک.): گۆزە.

**بەلووەبوون** (ئەردە.): (ئەردە.) بەلبوون، قیت و ڕەپبوون.

**بەلووەشین** (باد.): نەخۆشییێکی زۆر سەختە.

**بەلووجە** (شا.): چەند دارێکی کورت و قوڵە و یەک بستین، کە سەری دوو پارچە دەوارەکان تێکدەخرێن و دوو قوڵفەکانیان لە پاڵ یەکتری دەنرێن بە لووجەکان لە ناو قوڵفەکان دەنرێن تا نەیەنەدەرێ، بەڕوولە. دارێکی چکۆڵەیە دوو سەرەی ڕێژەی جووتی پێ توندەکرێ لە ڕێژانبەرە. بەڕوولەی دەوار.

**بەلۆچە** (ئەردە.): گیایەکە وەک ئەسپۆن جلکی پێ دەشۆرێ، چۆغان

**بەلوور:** بلوور، گلێز، کریستاڵ. بلوویر.

**بەلوورە** (دەر.): بالۆرە، کە لەکاتی کوتنیدا بەسەری قامکان لە گەروو دەدەن.

**بەلۆرە:** بالۆرەی ئافرەتان.

**بەلووری:** مەرمەرشا.

**بەلۆق** (باک.): (ڕەنگ) زیندوو، تروسکەدار.

**بەلۆک:** کسێکە نهێنی ئاشکرا بکات.

**بەلۆکە:** بەلورکە.

**بەلووکە** (هەورا.): میتکەی ئافرەتان، (هەو.) قیتکە، (ڕۆژ.) کورکە، پارچە گۆشتێکە لە نێو ئەندامی شەرمی ئافرەتاندا.

**بەلۆ:** نازناوی گورگ.

**بەڵێ:** بەلێ، (باک.) لەبێ، ئەرێ، ئارێ، با، ئا، ها، هەرێ، ئەم، واسە، وایە، بۆ وەراستگیرانە، لە وەڵامدانەوەدا بۆ شێوازـــ بەکاردەبرێت.

**بەلێ** (باک.): بەڵێ. بەڵکوو، بەڵان.

**بەلیاندن:** بەرداركردن، ویەردەن، پایەدار و جێگرکردن.

**بەلێ بەلێ:** ئائا، ئارێ ئارێ، ئێ ئێ، ئەی ئەی، ئەرێ ئەرێ.

**بەلیبۆر** (باک.): ئارامی، هێمنی، هێووری.

**بەلیتانک** (باک.): پەپوولە.

بەلیتانک

**بەلیتە** (باک.): جوورە گۆرانییەکە.

**بەڵێن:** پەیمان، دەستبەری، گفت. ـــ مارای، (هەورا.) ـــ مەردەی: بەڵێن شکاندن.

**بەلینا** (باک.): ماسی گەورە.

**بەڵێندان:** پەیماندان، دەستە بەربوون.

**بەڵێنی:** پەیمان، بڕیە، هەرێتی، ژووان، هەرێ، گفت. ـــ دان: پەیماندان، لە خۆگرتن.

**بەم:** بەو، بەئەمە. یەکێکە لە مرازانی ئاهەنگ و بەزم. ئام: کوند، کوندەبۆ. دەنگی قەبە، گڕ گەورە. فش، بەرزبووەوە، هەڵامساو.

**بەمانە:** بەئەمانە، بەئەوانە، (دەر.) بەیانە، بۆ چەند گیانلەبەر یا چتێکی نزیکە.

**بەمە:** بەئەمە، بەئەوە، بۆ یەکێکی نزیکە لە چت و گیان لەبەر.

**بەمەدا:** بەئەمەدا، بەئەوەدا، بەوەدا، لەمڕووەوە: ـــ دیارە کە: لەمڕووەوە دیارە کە.

**بەمبوو:** قامیشی هیندی.

**بەمبوول:** فێڵ، کەڵەک، داو، ساختە.

**بەمبوولە** (ئەردە.): مرۆی دەغەڵ.

**بەمبوون:** فش بوون، بەرزبوونەوە.

**بەمجوورە:** بەئەمجوورە.

**بەمزدان:** بەکرێدان.

**بەمزدەر:** بەکرێدەر.

**بەمم:** فش، بەرزبووەوە.

**بەمن چی:** بەندیواری بەسەر منەوە نیە.

**بەمێرد:** ژنی بەشوو.

**بەموو:** بڕوانە: بەمبوو.

**بەن:** دەزووی ئەستووره لە خوری ڕێسراو، (باک.) بەنک، (دەر.) بەند، بەنی خاو. ـــ ی کشت: پەرگ، پەرگە. (سۆر.) کێو، چیا، شاخ وەکوو: بەنی پیرمەم، بەنی باوی، بەنەنۆک. (زێ.) گەلاو پەلکی داروگیایان. (باک.) دارەبەن، داری قەزوانی. (باد.) دیواری بە ووشکە بەردانە هی دەورەی باخ و باخچە و ئیتر. دەوروپشتی دێ. گە، جومگە، جمگە. بەس، بەست، بەندیواری. بەندی قاقەزی، کە ٥٠٠ تەبەقەیە، بەستە. بەند، بەشێک لە پەرتووک. زیندان، گرتووخانە. دابەستن، بەستنەوەی وولاخ و ئیتر. بەستەی سندوق یا تفەنگ. بەند. بەندی پەپسۆک.

**بەنا:** دیوارساز، دیوارکار، گڵکار. گیایەکی کوێستانییە لاسکی وەک کەنگر و گەڵای وەکوو کەرەووز وایە دەکرێتە گزرە بۆ زستانی ئاژاڵان. گیایەکە وە کەمای دەچی بە سوورکراوەیی دەخورێ.

**بەناز:** نازگەر، نازکار، نازنوێن.

**بەناشووانە:** گیایەکی بۆنخۆشە دەکرێتە ماست و تۆراخەوە.

**بەناغ** (باک.): بناغە، بنچینە، بنگە، دەستوور.

**بەناڤ** (زا.): داری بناو.

**بەناڤ** (باک.): داری بناوێ. داری ئەستووری پتەوی قایم.

**بەنان:** نان بدە، بەخشندە، دڵفراوان. هەوابەندان، یەخ بەندان، سەرما، هەوا ساردی.

**بەناو:** بەنێو، بەهۆی، بەنێوبانگ، ناودار، نێودار. بەدناو. لەڕوو، لەڕووی پەرتووک یا پەڕاوی.

**بەناواچوون:** پیربوون.

**بەناوبانگ:** بەنێوبانگ.

**بەناوخووا:** بەناوی خودا.

**بەناوهاووردن:** ڕەنێوهێنان، پەروەردە کردن.

**بەناوی:** بەدناوی.

**بەنایی:** دیوارسازی، دیوارکاری، گڵکاری.

**بەنە** (دەر.): سامۆتە، بەنسامۆتە. بەندە، خولام، نۆکەر، زێڕکڕیو.

**بەنەخوون** (باد.): دژخین.

**بەنەخووێن** (ڕۆژ.): دژخین، بەندۆخین.

**بەنەر** (ئەردە.): بەندەر. ڕاوەستان، وێسان. (ئەردە.) ـــ ی: کەری سوواری، کەری سپی.

**بەنەشیشۆک** (بار.): جوورە دارەبەنێکە قەزوانی ناسک و وورد دێنێ و بە بەرەکەشی هەر دەڵێن: بەنەشیشۆک.

**بەنەفش** (باک.): بنەوشە.

**بەنەفشین** (باک.): وەنەوشەیی.

**بەنەن** (ئەردە.): بەندەن. کوێستان، ئێلاخ، کێفستان.

**بەنەووش:** وەنەوشە، بنەوشە.

**بەنەوشی:** بنەوشەیی.

بەن بڕ

**بەن بڕ:** چەقۆ، تیغ.

**بەنبوون:** بەند بوون. سەندنی چتێک لە یەکێک بە بێ پارە، دەست لێ گیرکردن.

**بەنپرچ:** (ڕەوا.) بەنجەل، (دەر.) بەندگیس، بنکەزی.

**بەنپێلاو:** قەیتانێکە پێلاوی پێ دەبەسترێ.

**بەن تەرک** (هەورا.): بەن سامۆتە.

**بەن تفەنگ:** قامیشی تفەنگ.

**بەنجەلە** (ڕەوا.): قەیتانی کەزی، بەن پرچ، (دەر.) بەندگیس.

**بەنجگەر:** بەندی جەرگ.

**بەند:** ڕستە، گەلەوورتە، هەڤۆک، تنە، گردە. جۆگەی گەورە، کە پڕ ئاوبێ، (کۆ.) شاخەت. بەندیخانە، گرتووخانە، دوستاخ خانە. فریو، ناز، تەفرە، پیلان، دۆلاب، بەندوباو. تەڵە، ڕشتە، داو، پێچەک، شەهبەن، تەلەزگە، ڕووشە. پایان، کۆتایی، بنەبڕ، بەستن، ڕێگابەستن. بێنک، (باک.) جەرد. گیرکردن، قەدەغە، بەرهەڵستی. ـ کردن: بەرهەڵستی کردن. ـــ ا پێووری: کۆمەڵەی هەڵبەستی هەستیاران، چامە(قصیدە) لە ١٦ بەیت کەمترنییە بەڵان تا ٢٠٠ بەیتیش ماوەی هەیە. هەڵبەستێکە لە پاش چەند تاکێکی پاشبەندەکەی دەگۆڕێ. بەش، گات، بەدل. گیر، چاوەڕێی، دووا، مەحتەل، گرفتاری، گیرۆدەیی. ـ کردن: گیرکردن، مەحتەل کردن. (دەر.) بەن. (باد.) دەستە، جووم. سنووری دووزەرییان، دیواری باخ و باخچان. بەربەستی ئاو. بەستە قاقەزێکە برێتییە لە ٥٠٠ تەبەقە، بەند لە چاپەمەنیدا (١٦) لاپەڕەیە. پەت یا زنجیرێکە دەست و پێی پێ دەبەستن.

**بەندان:** ئەم مۆرفیمە بەندەیە، کە بە هەندێک ووشەی تایبەتیەوە دەنووسێ لە کاتێکا، کە ئەو چتە تێکڕایی بێ: خەنە ـــ، دیارە لە خەنەبەندانێدا خەنە بە تێکڕایی بەکاردێنرێ، سەهۆڵ بەندان، یەخبەندان.

**بەندانە:** بەندەیانە، بەندەوار، وەکوو بەندان، کۆلانە.

**بەنداو:** جێگایە ئاوی کەمێک تێدا کۆبووبێتەوە، گۆلێکی پێشگیراوە بۆ باخ و باخچە و بێستانان. ئەستێر، ئەستێرک.

**بەندە:** کۆلە، نۆکەر، بەنی، خولام، کۆل، مزوور و کارکەرێکە، کە کڕابێ.

**بەندەخووێن:** دژخین.

**بەندەر** (باک.): دەرەگە، پەسار، پەسارگە، قەف، پوور، سترینگەم، گەشتیگا، مینا، ڕۆخ دەریایان. جێگایەکە لە کەنار زرێیان گەمێی لێ ڕادەوەستێ، ڕێگایەکەی بەردچنە لە کەنارەوە بۆ نێو دەریایە کشاوە بۆ نزیکی ڕاوەستگەی کەشتیان. شاری سەر دەریا.

**بەندەرگای جەوالّ:** بەندروو.

**بەندەرگای خیکە:** دەرێن.

**بەندەڤان** (باک.): زیندانەوان، زیندانەڤان.

**بەندەڤە** (باک.): ئاسنێکە لە ژێر پێی ئاشی دادەنرێ بۆ ئەوەی بەرداشی لەسەر بسووڕێتەوە.

**بەندەڤێ** (شار.): جوورە گیایەکە.

**بەندەک** (باد.): تا، لنگەبار.

**بەندەکە** (باک.): بار، دووتا، دوولنگەبار. گوریسێکە بە درێژی لە کۆزی بەرخانیدا رادەخەن و چڵچڵە گیای پێوە دەکەن تا بیخۆن. (شار.)

گیایەکە وەکوو کووزەڵەی وایە لەدەم ئاوان شین دەبیٚ و دەخوریٚ، (شار.) بەندۆکە، مەندیٚ.

**بەندەگەری:** نۆکەری، کۆلەیی.

**بەندەگەریٚتی:** نۆکەریٚتی، کۆلەییٚتی.

**بەندەگی:** نۆکەری، کۆلەیی، بچووکی، مزووری کرن بۆ یەکێک.

**بەندەمانی** (باک.): چاوەڕێیی.

**بەندەن:** هەوراز، بڵندی، بەرزی. لەش، ئەندام، بەدەن، قالب. ـــ ی کێوان و گردان: بەرقەدی کێوان، (باد.) بەتەن. قۆپی، قۆپەنی داران، چڕستان، دارستانی جەنگەڵ، جەنگەڵستان.

**بەندەوار** (بۆتا.): چاوەڕیٚ. گیراو، زیندانی، گرتی. وەکوو بەندان، بێکار. (بۆتا.) ـــ ی: چاوەڕێیی. گیراوی، زیندانیێتی. بەندەگیٚتی. بێکاری.

**بەندەیانە:** وەکوو بەندان.

**بەندەیی:** بەندەگیٚتی.

**بەندبڕ** (دەر.): بەنبڕ.

**بەندبوون:** مانەوە، گیربوون، گرفتاربوون.

**بەندبێژ:** شایەر.

**بەندبێژی:** شایەری، شایەریٚتی.

**بەندروو:** ئارشوورژن، (باک.) ئاشوورژن، (بابا.) خریٚنە.

**بەندک:** (زا.) بۆیینباخ، مەندیٚ، گیایەکە تێکەڵ بەمژاژی دەکریٚ. قەیتان. نووسراوگر، چتێکە نووسراوان بگریٚ.

**بەندکران:** پەکخران، ڕاگیر و مەحتەل کران، گیران.

**بەندکراو:** گیراو، مەحتەلکراو.

**بەندکردن:** گیرکردن، مەحتەل کردن. گرتن، خستنەبەندیخانەوە.

**بەندگیس** (دەر.): بەن پرچ.

**بەندڵ:** بەندی دڵ، ریشەی دڵ، ئارامی دڵ، ئارامی گیان.

**بەندۆ**(باک.): دەنگی مۆزیکایە.

**بەندوباو:** ئاوونرتک، نێوونرتک، بەیت و باو، دەنگ و باسێکی ناشیرینە، کە بکەوێتە دوای یەکێک؛ ووشیار هەر ڕۆژەی ـــ ێکی بەدوواوەیە. فرت و فێڵ، پلان، پیلان. ووتەی ساختە و هەڵبەستراو و بیٚ جیٚ، ئەفسانە. کێشە، تەشقەڵە.

**بەندوبەس:** بەنوبەس، پەیمان.

**بەندۆخین:** دۆخین.

**بەندۆک** (هەو.): بەنێکە لە پشتی دەبەستریٚ، (هەو.) بیبن، (زا.) نێخە.

**بەندۆکە:** گیایەکە بەهاران لە شاخان دەڕوویٚ، (باک.) بەنۆکە، بەنک، گەڵای وەک کەرەوز وایە بە ترشەوە دەخوریٚ. ژێر چەنە، ژێرچەناگە.

**بەندۆڵ:** باندۆلی کاتژمێری.

**بەندی:** نێوی نێرینانە. گرتوو، گیراو، گرتی، زیندانی، گراو، (باک.) بارەدار.

**بەندیەقە** (دەر.): بەرکۆژە.

**بەندی پەڕتووکان:** شازدە لاپەڕەیە واتا پەرتووک بەندبەند دەدرویٚ هەر بەندەی (١٦) لاپەڕەیە.

**بەندی تەسبیحی:** ڕشتەی پسپسۆکی.

**بەندی جگەر:** بەندی جەرگ وەکوو منداڵ و کەس و کاری نزیک.

**بەندیخانە:** گرتووخانە، بەند، گرتیخانە، زیندان.

**بەندیخانەوان:** زیندانەوان، پاسەوانی بەندیخانەی، گرتووخانەوان.

**بەندی دڵ:** بەندی جیگەر.

**بەندێر** (باک.): ئالاٚ، بەیداخ.

**بەندی گووارە:** زریزە یا قەیتانێکە گووارەی قورسی پیٚ هەڵداوەسریٚ تا گوویٚ هەڵنەدڕێتی.

**بەندی نیر:** (باک.) بەنیر.

**بەندیوار:** پەیوەند، نزیک، فڕ. ـــ ی: پەیوەندی، نزیکی، سەروکار

**بەنڕووبەنە:** بەنڕووبەند.

**بەنڕووبەند:** بەندی ڕووبەند.

**بەنزین:** شلەمەنیەکی ناسراوە گەلێک خۆشبەز و مەکینەکانی جیهان بەوی هەڵدەسووڕێن.

**بەنسامەتە:** بڕوانە: بەنسامۆتە.

**بەنسامۆتە:** (دەر.) بەندتەرکی، (هەورا.) بەن تەرک، بەنێکی هۆنراوەیی چووار لۆیە بەلای ڕاست و چەپی زیندا پاشکۆی پیٚ دەبەستریٚ.

**بەنسەعات:** بەندی کاتژمێر.

**بەنشەواڵ** (فە.، دەر.): دۆخین.

**بەنشەواڵین** (فە.): دۆخین.

**بەنشتۆک** (باک.): دارەبەن.

**بەنشەمشیر:** بەندی شمشیری، بەندی شیری.

**بەنقادە:** گوریسێکە بە قادەوەیە قادە و شەغرەی پێکەوە دەبەستێتەوە. بەن کەڵەوە.

**بەنک** (باک.): دارەبەن. سنوور، تخووب، قەمتەرە. پشتێند. بەن، دەزوو، بەنی ڕێسراو. بەنکیٚ فستۆک (باک.) گریٚ، ئاڵقە، گریٚ پووچکە. بەندۆکە (گیایەکە). ژێر چەنە، بەندی ژێر چەناگەی ژنان. داری قەزوان.

**بەنکاڵە:** شەمێند.

**بەنکەشی:** بنکەشی.

**بەنکەڵەمە:** بەنکەڵەوە.

**بەنکەڵەوە:** بەنکلاٚوە، بەنکەڵەمە، بەنقادە، بەنکەلاٚوە.

**بەنکەوانە:** گوریسێکی باریکە بەهەردوو پێچکەی (شەغرە) ی پیٚ دەبەستریٚ.

**بەنکەی شاخ:** گریٚ، گرێی شاخی زیندەواران.

**بەنکلاٚوە:** بەنکەڵەوە.

**بەنکەوش:** قەیتانی قۆندرە.

**بەنکی فستۆک** (باک.): گریٚ پووچکە.

**بەنگ:** شیرەی گیایەکییە بەورشک کراوەیی لەگەڵ تووتن لە ناوجگەرە و ئیتر بکرێ چەشنە هوڕێ و سەر خۆشییێکی دەدات. گیانداری قەتیس ماو. کات. بەند: ـــ بوون: بەندبوون. جەنگە، کات، هەرەت. (باک.) بەنج، کە وەبەر کەپۆی نەخۆشان دەدرێ بۆ بێهۆشی.

**بەنگا** (هەورا.): کەلەبەری ئاو.

**بەنگە** (ئەردە.): بن، سەر چاوە، شووێنی هەڵبەستنی ئاو، بەند. زەنگەتەترێ. جمگە، جومگە.

**بەنگەری** (بارز.): (گەرد.) ڕیەنگ، (ئەرگوو.)شاوێری، ڕێواسی قوڵەبنە و پەلکی پانە.

**بەنگەی شاخ:** گرێی شاخی ئاژاڵان و ئیتر.

**بەنگەڵ** (هەورا.): بەنگڵەژیلە.

**بەنگەی ناخوون:** گرێی سەرقامک.

**بەنگەی شاخ:** گرێی شاخ.

**بەنگ بوون:** بێهۆش بوون.

**بەنگ کێش:** کەسێکە فێری بەنگ کێشانێ بووبێ. ـــ ی: بەنگ کێشان.

**بەنگڵەژیل:** جوورە گیایەکە لە مێرگ و تەڕاییدا پتر دیتراوە.

**بەنگ و بلو:** بەندوباو.

**بەنگۆروا** (ئەردە.): بەندی گۆڕەوی.

**بەنگۆکە:** بەندۆکە.

**بەن وبەس:** بەندوبەس.

**بەنگۆڵە:** (کۆ.) مێتوولە، مێتوولکە، ئەسپێی وورد.

**بەنگە** (باد.): پێشانگا.

**بەنگی:** گێژوهوڕ، ووڕ، گێژ ووێژ، سەودایی، سەوداسەر، بەندی.

**بەنگین:** نێوی پیاوانە. مرۆڤێکە لە چاخ و بەنگی خۆیدا دەژی. جووان و تازە پێگەیشتوو.

**بەن مووتاوین:** بەندروو.

**بەننە:** خولام، زێڕ کڕیو.

**بەنووشت:** بنێشت.

**بەنۆکە:** بەندۆکە(گیایەکە)، بەنۆڵە. (باد.) داربەنۆک، دارەبەن.

**بەنووکە:** بڕوانە: بەنۆکە.

**بەنۆڵە:** گیایەکی ئاوییە لەگەڵ کووزەڵەدا، لە ئاودا سەوز دەبێ.

**بەنووڵە:** بڕوانە: بەنۆڵە.

**بەنهەڵکردن:** بەنکردنە گلۆڵە، کلۆڵەکردنی بەن.

**بەنی** (فە.): دابەستوو، دابەستی. (باک.) بەندە، نۆکەر. شیرنیاتێکە لە دۆشاو و گوێز دروست دەکرێ. زنجیرەی کێوان. کێو، شاخ، چیا، وەکوو بەنی پیرمەم، بەنی باوی، بەنەنۆک. (زا.) سجووق. خشڵی پلپلەدار. بەندی، گوناهکار. ئەوانەی بەدارەوە بەن کراوون. بەنێکە گوێز و هەنجیری پێوە دەکرێ.

**بەنیر** (باک.): بەنی کەڵەمەی ملی گاجووت.

**بەنیشت** (باک.): بنێشت.

**بەنێو:** بەناو، بەناوبانگ، نێودار.

**بەنیوان:** زیندانەوان، زینانەوان، دوساخچی.

**بەنێوبانگ:** زۆر ناسراو، نێودار. ـ ی: ناسراوی، نێوداری.

**بەو:** بەئەو، بەئەم، بەم. وەرە.

**بەوا** (دەر.): بەبا، بەفاڵ.

**بەوار** (ژا.): خوواری، (دەر.) چەفتی.

**بەواسی** (باک.): بێوەسیری.

**بەوە:** بەئەوە. ـــ بڵێ، بەوە بێژە.

**بەوەرز** (هەورا.): داعبایەکی چوار پێی دڕندەیە لە پشیلە بچووکترە.

**بەوەسیری** (ئەردە.): مایەسیری، بێوەسیری.

**بەوەی کەم** (موک.): لەکاتی سووێندخواردنێدا بەکاردەبرێ، دەڵێن: بەوەی کەم نامرێ و مەبەس لە خودایە.

**بەوجوورە:** بەو چەشنە.

**بەوور** (موک.): جانەوەرێکی دڕندەیە و لە تیرەی پڵنگانە و هێندەی سەگێکییە تووکی ڕەنگاوڕەنگە، ووشەک، (ڕەوا.) وەیشەک، ببر. (جا.، بابا.) بەفر، (باد.) بەڤل.

**بەوورەشینە:** بەفرەشینە، کولکە پیرێژنە، کولکی سۆتنی، برینێکی پیسە وەکوو موو لە دەست و پەنجە دێ.

**بەوورەشینکە:** بەفرەشینە.

**بەوورەوە** (فە.): وەرەوە.

**بەوروو** (جا.، هەورا.): پڕیشک و سووتەکی ئاورییە، کە بڵند و بەرز دەبێ، ئەو تۆز و خۆڵەیە لە نێو دووکەڵی ئاوری و هەڵمیدا بڵند و نەوی دەبێ.

**بەووری بەیان:** جوورە دڕندەیەکی بچووکە لە تیرەی پڵنگانە.

**بەووز:** بووز، دارتۆفانە، نارەوەن، دارەقەیسی ڕەشە. جوورە دارێکی گەورەیە وەک توو بەڵام گەڵای باریکترە، بەرەکەی قوزاخەیە و پڕە لە مێشوولە.

**بەووش:** دارێکی دانەداری پانە دەیخەنە ناوەندی تان و پۆی جاجمەوە تا پێی بکوتن و سفتی کەن. قۆڵ، نێوانی ئانیشک و سەرشان. پانیەکێش.

**بەوشەل** (ڕۆژ.): پشت سەر، پانایی پژمل.

**بەوشی قۆڵ:** قۆڵ لە ئانیشکەوە تا سەر شان.

**بەوون:** بوورە، بەیار. (لو.) بۆن.

**بەوون نیشتەیەرە** (هەورا.): بە خووێن دانیشتن، زەحیری.

**بەهـ:** بەهبەهـ، پەح، پەحپەح، ئەی هەی، ئافەرین، پەهپەهـ، لە کاتی واق و ووڕمان یا پەسندکردنێدا بەکار دەبرێت.

**بەهە:** بەهبەهـ، پەح، بەهـ لە و باخەخۆشە، ووشەیێکە لەسەردەمی زۆر پەسند کردنێدا بەکاردەبرێ.

**بەها:** نرخ، مز، بایی، بها، خاراج، وەج، (کە.، هەورا.) وەجەل. پەحی، پەهها، لەکاتی سەرسووڕمان یا باوەڕنەکردنێ یا پەسندنەکردنێدا بەکاردەبرێت.

**بەهادار:** نرخدار، کۆڤیک، پڕبەها. ـ ی: نرخداری، پڕبەهایی.

**بەهار:** سێ مانگە لەنێوانی کەژی زستان و هاوینێدایە و پیرۆزترین جەژنەی کوردان، کە نەورۆزە لە یەکەمین ڕۆژی مانگی یەکەمین بەهارێدا دەست پێدەکات، بهار، بوهار، بووار، (هەورا.) وەهار، جەژنی گوولان، گوڵهێنەر، گیانپەروەر. جوورە هەڵپەرینێکیشە. نێوی ئافرەتانە.

**بەهارات:** دەرمانگەرم، ئیسیوەت، ئالات، ئاڵەت.

**بەهارارا:** هەڵبەست بە بەهار هەڵکوتن.

**بەهاران:** سەردەمی بەهاران، کاتی بەهاران. (ان): مرازی کۆیە واتا چەند بەهارێک.

**بەهارە:** بەستەیەکە لە گۆرانیەکانی سابلاخ. بەهاروو.

**بەهارەکانی:** بوهارەکانی، هانەدرۆزنە، کووێرەکانی، بووارەکانی، وهارەکێنی، (هەورا.) بێلوو، دەهنگابە.

**بەهاربەن:** بەهاربەند.

**بەهاربەند** (موک.): تارمەی پێش پەنجەران، سەرگیر. حەوشێکە ئاخوڕی تێدا هەڵبەسترابێ و وولاخی تێدا ببەسترێتەوە لە هاویناندا.

**بەهاروو:** دەغڵی بەهارێ، (باک.) بهارە، (ڕەوا.) بەهاری، جوورە گەغێکە لە سەرەتای بەهارێدا دەچێنرێ نانی خۆش و خواردنی سووکە.

**بەهاری:** بەهاروو. جلکی بەهاری: بەرگی بەهارێیە. بەرهەمەکانی بەهارێ.

**بەهاز** (ڕۆژ.): بەهێز، بەتین، زۆردار.

**بەهانە:** بۆنە، بیانک، لام، پەڵپ، مهانە، (باک.) بهانە، پرزە، وورک، بیانوومارک، تەشقەڵە. ــ بڕین: پەرزەبڕین. ــ گرتن: پەڵپ گرتن، بهانە کرن، وورک گرتن، بیانووگرتن. ــ هێنانەوە: بیانووهێنانەوە.

**بەهەجاندن:** ڕژدی، چاونزاری، چاونزێری. (زا.) تووڕەکردن.

**بەهەجۆک** (زا.): مرۆی تووڕە و قەڵس.

**بەهەشت:** ئاو و هەواخۆش، دەڵێن شوێنێکی زۆر خۆشە پڕە لەدار و بار و ئاو و جۆگەو ڕووبار و هەموو چەشنە میوەیێک گۆیا بۆ خاسان دروستکراوە، لە ڕووی پێهەڵکوتن و هەڵنانەوە لە خۆشیدا هەر وەکوو کوردستان دەچێ خودابکا لە ڕۆژی پەسڵان (ئاخرەت)دا دەستمان لە کوردستانەکەی خۆمان بەرنەبێ بەهەشت و حۆری و .... ئەمان ئاوێت. ــ ی: ئەو کەسەیە کە چووەتە بەهەشتێ یا دەچێ. لە ڕووی ڕێز و شێوازەوە بۆ کۆچکردووانیش بەکار دەبرێت.

**بەهەشتی جاویدان:** ئەو بەهەشتەیە کە هەر بووە، هەردەشبێ، (ئاو.) مینوو.

**بەهەشتی دڵ:** خۆشی دڵ.

**بەهەوا:** بەحەوا، بەبەرزی. بەفیز، لووت بڵند، فیزدار، بستە. ــ بوون: پەنگهین، پەنگهان. ــ یی: فیز، لووت بڵندی.

**بەهەواداڕۆیین:** بەهەوادا چوونی فڕۆکە باڵندە و یا تەپ و تۆز و پووش و پەڵاش.

**بەهبەه:** پەهپەه، ئافەرین، ئۆف، (شن.) ئیفت، تەف، پەح، پەحپەح، پەححا، بەه، بەهبەه، لە کاتی دیتنی چتی جوان و شۆخ و بەشان و شکۆ یا ئازادا، کە پەسند بکرێ بەکاردەبرێ.

**بەهتاندن** (باک.): واق و وڕکردن. ترساندن.

**بەهتین** (باک.): واق و وڕمان. ترسان. ببەهتە: واق و وڕمێنە، بترسە.

**بەهر:** بەش، پشک.

**بەهرە:** بەرە، بەش، پشک، پەش، دژ. سوود، قازانج، کەلک، دۆ (باک.) بەهرەک، بەشێکی باش، کە خولا بیدا بە یەکێکی. بێ ــ: بێ بەش، بەشبڕاو، بێ سوود، بێ کەلک، (باد.) زڕبەهر.

**بەهرەچە:** بەهرە، دەرامەت.

**بەهرەدار:** بەهرەمەند، خاوەندبەهرە. ــ ی: بەهرەمەندی.

**بەهرەک** (باک.): بەش، پشک.

**بەهرەمە:** مەتکەی دارتاشی.

**بەهرەمەند:** خاوەندبەهرە، سوودمەند، بەهرەدار. نێوی پیاوانە. ــ ی: خاوەندبەهرەیی، بەهرەداری، سوودمەندی، بەهرەوەری.

**بەهرەوەر:** بەهرەمەند، بەهرەدار. ــ ی: بەهرەمەندی.

**بەهرپار** (زا.): بەش.

**بەهرک** (زا.): دەریاچە.

**بەهرکرن** (زا.): بەشکردن.

**بەهرێز** (زا.): پارێز.

**بەهزی** (باک.): مەڕێکە سەری کەمێک زەرد بێ.

**بەهس** (زا.): پاس.

**بەهسک** (زا.): مێشوولە.

بەحسک

**بەهلنگی** (باک.): سەنیری ژێر پێیان.

**بەهناف:** باشترین ناو. نێوی نێرینانە.

**بەهنام:** بڕوانە: بەهناف.

**بەهۆرە:** خاوەند عەزم و ئیرادە.

**بەهووردە** (گەر. ، زرا.): بلیمەت، کەمۆ، ڕامیار، بەرگەر. بەسەلیقە.

**بەهێ:** بەه، بهۆک، بیووک، بەهۆک، بەیانە، بیۆک، بینۆک، بێ، بەی، بەدارەکەشی هەر دەڵێن. نێوی ئافرەتانیشە.

**بەهێز:** بەتین، خورت، ئازا، بۆکە.

**بەهیڤ** (باک.): بادام، باوی. کۆتر.

**بەهیڤئاژنگ** (زا.): بادامی تاڵ.

**بەهیڤ تاڵ** (باک.): بڕوانە: بەهیڤئاژنگ.

**بەهیڤ تەڕک** (باک.): بادامی تەڕ، بادامی سەوز.

**بەهین** (باک.): بازدان، هەڵبەزینەوە. هەڵبەز، باز.

**بەی** (ڕۆژ. ، هەورا.): بێ، بەهێ، بەیانە. بۆچی، لۆچی، لۆ، بۆ. بەیانی، سبەینێ.

**بەیات:** نان و چێشتی ماوەوەی شەوێیە، کتووت. تیرەیێکی کوردە لە دەورووبەری شاری کەرکووکێ. جوورە مەقامێکە.

**بەیاتە:** ڕۆنی بەزو دووگ.

**بەیاتی کورد:** جوورە گۆرانییێکی کۆنە.

**بەیاخ:** بەیداغ، ئالا. ــ دار: ئالاهەڵگر، بەیداخدار. ئافرەتی بێ شەرم و شیرەت.

**بەیاد:** لە یادگیر.

**بەیادکردن:** یادکردنەوە.

**بەیادیکردن:** بێ خەوی و بێ کەیفییە بە هۆی نەخۆشی یا لە ڕانەهاتنی شوێنێک پەیدا دەبێ.

**بەیار:** بوور، بیوور، دەم، سەر، نەڤەکری، بایەر، زەوییەکە قەت یا چەندساڵێک نەچێنرابێ. قسەی پێچراوەوەی نادیار. (خۆ.) زەوییەکە تازە قاشۆی مێوی لێ بچەقێنن تا دووسێ ساڵان بەیاری پێ دەڵێن. (باک.) شەپۆل، ناساخ، بێ دیققەت. بێ کەلک، بێ سوود، شەخرە.

**بەیاز:** کەشکۆڵ، کۆمەڵە هەڵبەستی چەند هەستیار و بووێژێکییە.

**بەیان:** شەوەکی، بەیانی، سپێدە، تاریک و ڕوونی بەیانی. ـــ ی زوو: سبەینێ زۆر زوو، دەمەدەمی بەیانی.

**بەیانە:** گوڵێکی سوور و زەرد و سپی بێ بۆنە. (دەر.) بەمانە، بەوانە. بەهێ، بێ

**بەیانەکی:** تاریک و ڕوونی بەیانی زۆر زوو، بەیانی، شەوەکی.

**بەیانی:** شەوەکی، بەیانەکی، سبەینێ، سۆزی، سبەهی، تاریک و ڕوونی بەیانی، (باک.) پەزوودان، تاریکەوور، (باک.) تاریکەورک. ـــ زوو: شەوەکی، بەرەبەیان.

**بەیانیان:** سبەینان.

**بەیانی باش:** سبەینەباش.

**بەیایی** (بابا.): گریانێکی بەکوڵە وەکوو گریانی منداڵێکی، کە لە دایکی دوورکەوتبێتەوە.

**بەیایی کردن:** بەیادیکردن.

**بەیەخەداکێشان:** مەبەس لەوەیە منداڵێکی بێگانە بکەیە منداڵی خۆت.

**بەیەخەداکێشیاگ:** کەسێکە منداڵێکی بیانی کردبێتە هی خۆی.

**بەیەکاچوون:** چوونی چەند چتێک بەناو یەکتریدا. تەنران. بەگژ یەکتریدا چوون.

**بەیەکدادان:** لێکدانی دوولەشکر یا دوو دەستە. تاوێتەکردن، تێکەڵ کردن. ڕووخاندن، داغانکردن.

**بەیەکەوەدان:** پێکەوەنان، لێکدانی دووچت.

**بەیەک گەیشتن:** گەیشتنی دوو کەس یا دووچت، بەیەکتری، گەیشتنە یەکتری.

**بەیبوون:** بیبوون، بابوونە، گوڵەڤەقێ، جووری گوڵێکی زەرد و بۆنخۆشی کێوییە پەڕەی سپی و ناوەکەی زەردە، زەردییەکەی کاڵە، لە چیایان دەڕووێ بستێک بڵندتر دەبێ بۆنی لە دوورەوە دێ گوڵەکەی بە کۆمەڵەو وورد و زەردن، لاسکەکەی سووری گەڵایەکانی وەکلکی سمۆرەی دەچێ، گوڵ و گەڵایەکانیشی پێکرا بۆنیان زۆر خۆشە، کە بە چا بخورێتەوە بۆ زگ ئێشە زۆر باشە.

**بەیبوونە:** بابوونە، بەیبوون.

**بەیت:** تاکە هەڵبەستێکە، گۆرانییەکی درێژ بێ بەیتی پێ دەڵێن، داستان، بەیتی دوازدە سوارەی مەریوان.

**بەیتاک** (باک.): چۆلەکە.

**بەیتاڵ:** پزیشکی ئاژاڵ و وولاخان.

**بەیتەشە:** بێتەشە، ئێسترێکە، کە بۆ بارکردن و سواری نەوەستێ.

**بەیتک** (باک.): چۆلەکە. (زا.) چتی بێ کەلک.

**بەیجە:** پەیژە.

**بەیچەڵ** (موک.): نەزۆک بۆ هەموو جوورە گیان لەبەرێکی بەکاردەبرێ

**بەیداخ:** ئالا، (باک.) بەندێر، (هەورا.) ئالایی، درەووش، بەیاغ، بێداغ. ـــ دار: ئالادار، ئالاهەڵگر، بەیاخدار، درەوشدار. ـــ ی: ئالاداری.

**بەیدامالی:** بەیدا ماڵی شێخ بزەینی، (مەرگە.) زەیرە، دارە هەنجیرێکە، کە هەوەڵ بەری وەراند تەنها چەند هەنجیرێکی پێوە دەمێنێ، کە (باقۆ) یان پێ دەڵێن و لە پێش هەموو هەنجیرێکی دیکەدا لە بەهارێدا پێدەگات.

**بەیدانە:** دەنکی بێ، بێدانە.

**بەیدەر:** بێدەر.

بەیداغ

**بەیدەست:** دیل، ئێخسیر، دەستەپاچە، جوورەدارە هەنجیرێکە، کە هەوەڵ بەری وەراند چەند هەنجیرێکی پێوە دەمێنێ، کە باقۆیان پێ دەڵێن وە لە پێش هەموو هەنجیرێکی دیکەدا لە بەهارێدا پێ دەگات. ـــ کردن: دەستەپاچەکردن. ـــ ی: دیلی، ژێردەستی، ئێخسیری.

**بەیر:** بارە، سوود، دەرامەت.

**بەیرەق** (باک.): ئالا.

**بەیرەقدار** (باک.): ئالادار، ئالاهەڵگر، بنەماڵەی کوردێکن لە شامێ. ـــ ی: ئالاداری، ئالاهەڵگرتن.

**بەیرەم:** بار، ئاسنێکی درێژ و ئەستوور و سەرتیژە بەردی قورسی پێ هەڵدەکەنن.

**بەیسە** (هەورا.): سەهۆڵ، چلوورە.

**بەیکریان** (دەر.): پێکەوە، پێکرا، تێکرا.

**بەیگەیشتن:** پێ گەیشتن، پێ گەیین.

**بەیلووت** (باک.): گۆرانی هەڵپەڕینێیە. جوورە هەڵپەڕینێکە.

**بەین** (هەورا.): پەیان، میانە، بەندیواری، نێوان.

**بەینەت** (هەورا.): پەیان، نەمەک، بەڵێنی.

**بەینەتدار:** پەیماندار، نەمەگدار، بەنەمەگ. ـــ ی: نەمەگداری.

**بەینەشە** (هەو.): بێ شەرم، بێ چاوەڕوو.

**بەینێ:** چەندێ، گایێ، کاتێ، ماوەیێ.

**بەیواستن** (دەر.): پێویست، پێداویست.

**بەیەهڵگریان** (دەر.): پێپەهڵگەران، پێ هەڵچوون.

**بەیی:** دووزمانی، قسەگێڕانەوە.

**بەیین**(باک.): ژاکاندن، ووشک کردن، هەڵبەزین.

**ببە:** بە.: پیاوبە، ئازابە، لە دەمکاتی داخوازی و فرماندا بەکاردێت.

**ببرببر:** هەتاهەتایە.

**ببڕای ببڕ:** هەتاهەتایە.

**ببڕای ببڕای:** هەتاهەتایێ، بەکاردەبرێ بۆ دووپات نەکردنەوەی کردار یا ووتارێک.

**ببڵە:** بەبەڵە، بێچووی هەر گیاندارێکی بێ.

**ببێ:** بڵێ. گوێت لێ بێ.

**ببیی:** (ژا.، هەورا.) بۆ، (موک.) بی.

**ببینە:** بڕوانە، تەماشاکە، (هەورا.) بدیە.

**بت:** هەڵامەت، پەسیو. وێنەیەکی قەبارەداری دروستکراوە بۆ پەرستن، بوت، لە ناوی بتلیس قوڵەکراوەتەوە بۆ سەرچاوەکانی ئەم فەرهەنگە.

**بتە**(باک.): بەتۆ، بەتۆوە، بەهۆی تۆوە. (ئەردە.) پنچک، متک، گیایەکە لق و پۆپی زۆربێ و بنەکەی ئەستوور نەبێ و زۆریش بڵند نەبێ.

**بتەو:** پتەو. ـــ ی: پتەوی.

**بتەڤیی** (باک.): پێکەوە.

**بت پەرست:** بوتپەرست. ـــ ی: بوتپەرستی.

**بتخانە:** بوتخانە.

**بتر** (باک.): دڵکرانەوە لە خۆشیان، دڵخۆشبوون. پتر. ـــ بوون: پتربوون.

**بترەک** (باک.): بێ شێواز، ناتۆرە، بێ تۆرە، بێ ئەدەب.

**بترپیر:** بەسرپیری.

**بتری:** بوتری.

**بتلیس:** شارێکی ناوداری کوردستانە دوو مرۆڤی بەناوبانگی پێگەیاندووە: ١) شەرەفخانی بتلیسی، کە مێژووی کوردانی بەزمانی فارسی نووسیوەتەوە. ٢) مەلائیدریسی بتلیسی: مێژووی عوسمانییانی بەزمانی فارسی نوسیوەتەوە بەوەش ڕانەوەستا چەند پارچە کوردستانی سەربەخۆی خستە ژێر دەستی ترکانەوە.

**بتم** (باک.): ڕۆنی ترەبەنتینی.

**بتن:** پاشگری ـ تن خراوەتە دووای بوون لە گەلێک باراندا، جگەرخوێن دەڵێ: لە بادینان و هەکاری و بۆتان و شاری وان بەکاردەبرێ ئەمن دەڵێم لە زۆرترین پارچەکانی کوردستاندا بەکاردەبرێت: دەبیتن، نابیتن، هاتبیتن.

**بتۆم** (باک.): لەشکر، دەستە، کۆمەڵە.

**بجەنگ:** شەڕکەر، شەڕانی، جەنگاوەر.

**بجگە** (ئەردە.): بێجگە.

**بجە** (باک.): بڕۆ، هەڕە، هەڕۆ، بچۆ.

**بچەنگانێ:** چنگەپۆپانێ.

**بچڕان:** پچڕان.

**بچڕاندن:** پچڕاندن.

**بچڕبچڕ:** پچڕپچڕ، پرتکەپرتکە، پارچەپارچە. ـــ بوون. ـــ کردن.

**بچرک** (باک.): جوورە کولێرەیەکی شەکرییە، ناوساجی، کولێرەی بەرۆن.

**بچڕیان** (ئەردە.): پچڕان.

**بچڕین:** پچڕین.

**بچکەڵە:** پچکۆلە.

**بچکۆلانە:** چکۆلانە.

**بچکۆڵە:** چکۆڵە، پچکۆڵە.

**بچووک:** گچکە، چکۆڵە، (هەورا.) گولاڵە، (دەر.) بوچک، پچووک، (بۆتا.) منداڵ، زاڕۆ. ـــ یێت من: منداڵانی من.

**بچووکاهی** (باک.): بچووکێتی، منداڵێتی.

**بچووکەڵە:** چکۆڵە.

**بچووکی:** گچکەیی، بەندەیی، چکۆڵەیی، پچووکی.

**بچووکێتی:** بچووکاهی، منداڵێتی.

**بچۆلە** (ئەردە.): گچکە.

**بخەف:** زۆر بەخەو.

**بختیان:** بوختان.

**بخچک** (باک.): باخچە.

**بخوواز:** خوواستەر، ویستەر.

**بخووالتێ** (باک.): کچی خاڵ.

**بخووالتی** (باک.): کوڕی خاڵ.

**بخۆر:** زۆر خۆر.

**بخوز:** گایەکە لەکاتی کاردا بنووێ.

**بخوویر** (باک.): جوورە گوڵێکە.

**بخووین:** خووێناوی، بەخووێن.

**بخیر** (باک.): ترێی سەوز و شینی نەگەیشتوو.

**بخێر:** بوخار. ـــ یی (باک.): بوخاری، کوورە، نوغەیری.

**بدار** (باک.): کەسێکە ماڵ و سامان و نەوایەکی هەبێ، دارا.

**بدارڤەکرن** (باد.): ڕێکخستن، ڕێک و پێک کردن، خنکاندن، هەڵاوەسین..

**بدەر:** دایەندە، دایندە، ئەو کەسەیە چتی بدات.

**بدە:** وەدە، وێدە.

**بدەڤ** (باک.): بەدەم، سەرزارەکی.

**بدەک** (باک.): بەزات، ئازا، بەجەرگ. فێڵباز، فێڵەزان.

**بدەو:** بەغار، قۆچاخ، چوست، چالاک.

**بدەهم** (باک.): سزا، سەرانە.

**بدلیس:** بتلیس.

**بدوو:** کەسێکە بزانێ بدوێ. (باک.) پەدوو، پووک.

**بدۆهت** (باک.): ئەستێرەیەکە لەوانی گەڕیدە، ڤینۆس.

**بدێ:** بەخشش، دەسەنە.

**بدی و بسان:** داد و بسەد، دان و ستاندن.

**بدیە:** بڕوانە: بنۆڕە، بڕۆنە، تەماشاکە. بدی.

**بر:** بات، جیات، لە ـــ ی: لە جیاتی، لەباتی.

**بڕ:** بڕوانە: بڕەدار. توانایی، زات، هێز، پڕ، ڕجڵ، پڕکێشی، ڕجڵم بڕیا: لە بڕ بوومەوە. ـــ ناکات: زات ناکا، پڕکێشی ناکات. ـــ کردن: زاتکردن، ڕووهەڵاوێژتن، توانین. ببڕ، بڕندە، بڕۆک. کەم، چک، تۆز، نەخت، هێند، هەند، بۆش، بێش، گەل، بەش، ـــ یکم قاقەز بدەیە: کەمێکم قاقەز بدەیە. (دزە.) پارچە، بەش، تیکە، کوت. ـــ بوون: پارچەبوون،

بەشبوون، جۆخینەکە بڕکرا: جۆخینە دابەشکرا. مەڕەکە ـــ کرا: مەڕەکە پارچەکرا. پا، بووار، (باک.) بار، (ڕەوا.) تەنکاو، بڕدان: پادانی چۆم و ناوان دەربازگەیەکە لە ڕووباران و شوێنێکە پا بدات و مرۆ بتوانێ پێیدا بپەڕێتەوە. (هەورا.) بڕکەی خەیار و ترێزو و ئیتر، پەنجی گیا و هەموو جوورە ڕووەکێک. بەدەن، لەش. (فە.) پسک، فسەزمان. براتووتە، براتووتەڵە، قامکی دووەمە لە نێوانی تووتە و هەڵمەقووتەیدایە. لق، لک. ـــ یک دار: لقێک دار. بڕیە، گۆترە، سەرجەم: ئەمە لە ـــ بەچەندییە.

**برا:** برادەر، براڵە. ئەو نێرینەیە، کە لە دایک و بابی مرۆی بێ و یا لە یەکێک لەوان بێت، برای باب: مام، ئاپ، ئاپۆ، برای دایک: خاڵ، لالۆ. بردرا، بریا، کرداری ڕابردووە بۆ یەکێکی نەدیوە.

**بڕا** (باک.): بەڕاستی؟، بەڕاستیتە؟، ئایا ڕاستە، ئایا وایە.

**بڕانی** (ئەردە.): بەرایی، ئارەزوو. برادەری، برایی.

**برانیسقا:** نەخۆشی و دەردێکە لە ئیسقا سووکترە.

**برابب:** باب برا، (باک.) برابابڤ، مام، ئاپ، ئاپۆ.

**برابابڤ:** براباب.

**برابەش:** هاوبەش، بەشدار. خاوەند بەش. (نە.، شکا.) بابەلیچ.

**براتووتە:** براتووتەڵە، قامکەکەی تەنیشت قامکە تووتەڵەیە.

**براتووتەڵە:** براتووتە، براقچ.

**براخووا:** براخو: برای ژنی مرۆیە.

**بڕادە:** ووردەی زێڕ و زێو و ئاسن و ئیتر، ڕیک.

**برادەر:** ئاواڵ، دەستیار، دۆست، ئاشنا، ناسیاو، ئامبابی، (باک.) براک، هاواڵ، هەڤڕی، (لو.) برا. ـــ ی: برایەتی، دۆستایەتی، ئاشنایەتی.

**برادەرایەتی:** ئاوالآیەتی، دۆستایەتی، ئاشنایەتی.

**برادۆست:** ناوی ناوچەیێکە لە سنووری ئێران.

**برازا:** منداڵی برا، کوڕی برا: (باک.) برازی، کچی برا: (باک.) برازێ.

**برازازا:** نەوەی برا.

**برازاڤا:** برازاوا.

**برازاڤە:** بڕوانە: برازاڤا.

**برازاگ** (ئەردە.): برازا.

**برازاوا:** (باک.) برازاڤە، برا یا برادەرێکی زاوایە، کە لە ڕۆژی بووک گواستنەوەدا پشتێندی بووکی دەبەستی.

**برازە:** مرازێکە چتی قورسی پێ بەرزکرێتەوە.

**برازێ:** (باک.) برازا، کچی برا.

**برازی:** (باک.) برازا، کوڕی برا.

**برازن:** ژنی برا، ژن برا، (باک.، سور.) بوورا.

**براقچ:** برای تووتە.

**بڕاست:** بەڕاست؟.

**بڕاستی:** بەڕاستی. بەڕاستی؟، ئایا وایە؟.

**بڕاشتن** (باک.): برشت کردن، لە ڕۆنیدا سوورکردنەوە.

**بڕاشتی** (باک.): برژاو.

**براک** (باک.): برادەر، دۆست.

**براگەورە:** برای لە تەمەندا گەورەتر، کاک، کەیان، کەیین. ئاغا، کوێخا، مەزن، سەرۆک، گەورە.

**براله:** بۆ برای گچکە بەکاردەبرێ، لە ڕووی خۆشەویستییەوە بۆ هەموو کسێک بەکار دەبرێ. جوورە گیایەکە.

**براڵە** (هەورا.): براله.

**براڵەوشۆتی** (هەورا.): برای شیری.

**براڵەی هامشۆت** (هەورا.): بڕوانە: براله و شۆتی.

**براڵوو** (هەورا.): بەلاڵووک.

**براڵۆتووتێ** (هەورا.): براتووتەڵە.

**برامازگ** (ئەردە.): جوورە بەرێکە لەبەری دارەمازوو.

**برامان** (باک.): ڕامێن، بەپەرۆش، پەرۆشدار، خەمگین.

**بران:** بردران.

**بڕان:** بەتیغ یا مشار و چتی تر بڕان و یا بریندارکردن و یا لەت کران. دوور کەوتنەوە، هەڵبڕان، لێکدابڕان، قەرتلین. (دەر.) بازۆ، لێخوڕە. کەم و کووڕی، کورتی. لەبەر ـــ: کەم و کووڕی لێ پەیدابوو. تەواو بوون، کۆتایی هاتن، (هەورا.) بڕیان، نەمان.

**بڕانەوە:** دووایی هاتن، کۆتایی هاتن، بڕیانەوە، گەیشتنە بنەبانی، نەمانی چت. دووبارە یا چەند بارە بڕانی چت. بێ ـــ: پەیدەرپەی، یەکبینە، پەیتاپەیتا.

**بڕان بڕان** (ڕۆژ.): زۆر بەپەلە لێخوڕین، بەتاڵووکە ئاژوتن، پەلە پەلە لە ئاژۆتندا.

**بڕاندن** (هەورا.): بڕین، کۆتاکردن.

**بڕاندنەوە:** دار پێڕاهێنان، کۆتاکردن، گەیاندنە پایانی، (هەورا.) بڕیاندنەوە، بیبڕەوە: کۆتایی پێ بدە!.

**براندۆغ** (باک.): پاڵە، دروێنەکار. کەللەڕەق.

**براندۆک** (باک.): پاڵە، دروێنەکار.

**برانگوە** (باک.): سست، خاو، تەنبەڵ. هەوا، کێم و زووخاوی برینان.

**براو:** بردراو.

**بڕاو:** بڕدراو، (دەر.، هەورا.) بڕیاو.

**برایانە:** وەکوو برایان. ئاوالآنە، دۆستانە، خزمانە.

**برایەتی:** پێشەو کرداری برایانە لەگەڵ یەکتری. هاوالآیەتی، برادەرایەتی، دۆستایەتی، خزمایەتی.

**برای بب:** مام، ئاپ، ئاپۆ.

**برای تووتە:** براقچ، بابەلیچ، تیلکێ ڕۆخێ، (هەورا.) دلێ ڕاسینێ، قامکەکەی تەنیشت قامکە تووتەڵەیە.

**برای دیک:** خاڵ، لالۆ.

**برایەبۆگەنە:** (هەورا.) هەرەبەنگ، (باڵ.، پیرا.) بۆگەن، گیابۆگەنیوە، بۆ خارشتی دەرەوە باشە.

**برایی:** برایەتی.

**بره** (هەورا.): بڕژ. برژانێکی ناوونجییە، هێلکە و یا گڵی دیزە و گۆزە نابێ لەوە پتر ببرژێن: هێلکەکە یا دیزە و گۆزەکە ئەوەندە برژاوون لە (بره) چوون.

**برە**: یەکانە، بەرازی نێرەیە. دوو ددانە تیژو درێژەکانی بەرازییە، شفرە، مەرموول، کە بە ژێرقەپۆزی خوارەوەیە بۆ لای لچی ژوورووی بەرز بوونەوە و زۆر تیژن. قرتاندنی گوڵە پێغەمبەرە بۆ کوتانی. کەڵەمێرد. (لو.) کچ. بەیارێکە، لە زەوی لەنێوانی دوو وەرداندا، نێوانی دوو پەل لە زەوی. گۆترە، لە برێ. ناوگەرە، کەناری باخچە و کشتوکاڵە، کە کەمێک بڵند دەکرێ بۆ ئەوەی بەسەریدا هاتووچۆ بکرێ و کشتوکاڵ پێشێل نەکرێت. بڕیار، پەیمان.

**برەبڕ**(ڕژ.): گرەگر، گوڕەگوڕ، قیرەقیر بەسەر خەڵکیدا کردن.

**برەبرە**: پارچە پارچە، کەرت کەرتە، کەمکەمە، کوت و لەت و پارچەکانی مێگەلە مەڕانە. بڕبڕە، تۆزتۆزە، نەخت نەختە.

**برەدار** (شار.): لکەدار، بنەداری براو، قەدی داران.

**برەر** (هەورا.): بڕ (ددان).

**برەس** (ئەردە.): ڕزگاری.

**برەسۆرە** (هەو.): گزگزە، دارێکی گەرمێنییە.

**برەش** (باک.): پەرۆشدار، خەمگین، کەنەفت، هەژار.

**برەفان** (باد.): ناوبژیکار.

**برەک** (باک.): پۆپەی کەڵەبابییە.

**برەک**: بێچووەبەراز، کوودەڵە بەرازی یەکساڵانە و دووساڵانەیە، (هەورا.) بزڵە بەراز. نەختێک، کەمێک، پیچێک، هەندێک. (باک.) مشار. ــ کرن: بەمشار برینەوە. (گۆ.) مقەست، دوازدە مەگریجەنی، تۆرتۆ. (باک.) ئاسنێکە داری پێ دەبڕنەوە، تەوور.

**بڕبڕەک** (باد.): برینگی خوری برینەوەیە. مشار.

**برەکخانە** (باک.): مشارخانە.

**برەو**: باو، ڕمێن، بەرزبوونەوە و پتربوونی فرۆشی چتەک. بە ــ: بەباو، بەرمێن، ڕەواجدار. ــ پێدان: ڕمێن پێدان.

**برەوبردنەوە**: برەوسەندن.

**برەوپێدان**: برەودان بەکەسێ یا بە چتێک.

**برەوسەندن**: برەوپەیدا کردنی چتێک.

**برەوش** (باک.): تروسکەدار، بریقەدار، بەترووسکە.

**برەهن**: جوورە خورمایەکە. برهەند.

**برهەند**: کارتیغ، بڕهەن، (بابا.) نەرمەساو، (باک.) کارتیک، مەورەد.

**برهەنگ** (بابا.): برهەند.

**بڕبڕ**: کەمکەمە، پارچەپارچە.

**بڕبڕاگە**: بڕبڕەی پشتێ.

**بڕبڕاگێ** (هەورا.): بڕبڕەی پشتێ.

بڕبڕە

**بڕبڕە**: مرۆخە، ترەختە. ــی پشتێ: تیغەی پشتێ، تیغەڵەی پشتێ، پشتمازە، سنسل، کاریتەی پشتێ، زنجیرە ئێسکەکانی مووروغەی پشتییە، (گەر.) گارگارە، تیلەقەی پشتێ، (خۆ.) تیرەقی پشتێ، (کۆ.، دەر.) تیرەقەی پشتێ، (کە.) مۆرەغە، بڕبڕاگێ، (هەورا.) بڕبڕاگە، مرووخە، (ئەردە.) مۆرە. کەمکەمە، پارچەپارچە. بڕبڕەی پشتێ: پشتیوان، یاریکار. داسێکی گچکەیە.

**بڕبڕەومازی** (هەورا.): بڕبڕەی پشتێ.

**بڕبوون**: جوودابوونەوە، لێک برانی هەندێ گیانلەبەران لە یەکتری.

**برتەوبۆڵە**: پرتەوبۆڵە، بۆڵەبۆڵ.

**برتوبۆڵ**: پرتەوبۆڵە.

**برج**: بورج، کەلوو، کۆنگرە، قۆنگرە، گۆنگرە، (باک.) باروو، دژ، تیتاڵک، بورگ، بوشەرکردن. ــی ئاسمانی، وەرز، ساڵ دوازدە مانگە هەروا دوازدە بورجە و هەر بورجێکی بەرابەری مانگێکی شەمسییە. کۆشک و تالار.

برج

**برجفان** (باک.): ڕوون، خاوێن، خۆڕوو، وێژە.

**برجی پیرێژن**: حەوتووی پیرێژنییە، کە دەکەوێتە دووایی زستانێ چوواری وەبەر زستان و سێی وە بەر ناداریێ دەکەوی.

**برچتی** (باک.): برسێتی.

**برچی** (باک.): برسی.

**برچینا** (باک.): برسێتی، (باک.) برچتی.

**برد** (باک.): قامیش، زەل.

**بردان**: جووێکردنەوە، هەڵاوردن، پێشبرکە.

**بردەبار**: بارکێش، پشوودرێژ، سینگ فراوان.

**بردران**: بران.

**بردن**: (باک.) برن، (هەورا.) بەردەی، چتێک یا گیان لەبەرێک لەگەڵ خۆ بردن.

**بردن**: لەنێوبردن، لەناوبردن، تەفروتووناکردن، نەبووکردن، هەتاوبردن، سووتان؛ ئاووربردی: ئاگرسووتاندی.

**بردنەبەس**: بردنەبەست.

**بردنەبەست**: بەخت بەستن، بەخت ڕەشکردن. بەستن، بەندکردن، ڕێگالێ گرتن.

**بردنەسەر**: وەسەرخستن، بردنەسەرەوە. گەیاندنەپایان، دووایی پێدان، کۆتاکردن، قسەکەیاندنەسەر، تەواوکردن. بەڵێن و پەیمان بەجێ هێنان.

**بردنەژوور**: بردنەناوەوە.

**بردنەوە**: بەپێچەوانەی دۆڕاندن، سەرکەوتن لە یاریدا، قازانج کردن، لە قوماری سوودکردن. دووبارە چتێک بردنەوە شوێنی پێشووی.

**بردێر** (باد.): بەردیل.

**بردین** (باک.): جوورە ماسییەکە.

**بردیی** (باک.): جوورە گوڵێکە.

**بڕراو**: براو، بردراو.

**برژان**: سووربوونەوەی هەندێ چت بە ئاوور، (هەورا.) برژیان، (دەر.) برشیای. برژانگ، مژۆڵ.

**برژانەوە**: برینێک، کە دەرمانێکی تیژ و توندی لێدرێ دەبرژێتەوە، نیشانی برین لەکاتی برژاندنەوەیدا.

**برژاندن**: (هەورا.) برژیاندن، (دەر.) برشاندن، (باک.) براشتن، سوور کردنەوەی هەندێ چت بە ئاوور، برژانن، وورژانن.

**برژانلنەوە:** ـــ ی برینان: ماتە، کاڤینان، قرچاننەوە، کەوئێخستن، (باد.) کەواندن، دەرمانکردنی برینی تازە بە دەرمانی توند و تیژ تا تەشەنە نەکات و لێی پیس نەبێ.

**برژانگ** (هەورا.): مژۆڵ.

**برژانن:** برژاندن.

**برژاو:** سفتە، (فە.) برشیا، چتێکە لەسەر ئاوور برژابێ. نە ـــ: خاو.

**برژۆڵ:** برژانگ، مژۆڵ. ڕیشووی خاولی و نیتر. بژی گوڵەگەنم و جۆ.

**برژیاگ:** برژاو.

**برژیان** (هەورا.): برژان، (ئەردە.) وورژیان.

**برژیانەوە:** برژانەوە، قرچانەوە، قرچیانەوە.

**برژیاندن** (هەورا.): برژاندن.

**برس** (ئەردە.): برسێتی، (ئەردە.) وورە.

**بڕس** (ئەردە.): بڕست.

**بڕست** (ئەردە.): هێز و توانا؛ هەناو(بڕست)ت بڕیم.

**برسک** (فە.): برسی.

**بڕسکان:** لە خۆڕا قسە و پللار ئاوێژتن. هەڵگەڕانی شیر: بڕکانەوە. ـــ ی چێشت: ڕەپسین.

**بڕسکاندن:** ـــ ی قسە: بە بێ دەستەڵات قسەکردن و یا پلار ئاوێژتن. ـــ ی ئاوات: ماخولیای ئاوات بوون.

**بڕسکاو:** هەڵبزڕکاو، تێکچوونی شیر.

**برسی:** (باک.) برچی، (هەورا.) ئاورا، وورسی، (دەر.، فە.) وورسک، ڕەودین، سێرووژە. ـــ بوون: (ڕۆژ.) هەورایی، گیاندارێکە پێویستی بە خواردنێک بێ، کە بەری دڵی بگرێ.

**برسێتی:** (هەورا.) ئاورایی، وورە، (ئەردە.) برس، برچتی، (باک.) ناز، سێرووژەیی، پێداویستی گیاندارێک بۆ خواردنێک، کە بەری دڵی بگرێ.

**بڕش**(فە.): کەڕوو. ـــ هەڵێنان: کەڕووهەڵێنان.

**بڕشانەوە:** برژانەوە.

**بڕشاندن:** برژاندن.

**بڕشت:** بڕین، زۆر، پێز، پیت، ڕێژە و فەڕ، بە ـــ: بە پێز و ڕێژەوە (بە بەرەکەتە)، هێز، توانایی. سەلیقە، لێ هاتوویی، ووشیاری، زانایی، بە ـــ: بەسەلیقە، کارزان. ـــ دار: پڕزۆر، هەراش، توانا، بەسەلیقە. ـــ ی ئاسن: ووردە ئاسن، کە بە کارتیغ یا چتێکی تر ڕنرابێ. ـــ ی بەرگەروان: ئەو پارچە وورد و بڕاوو فڕێدراوانەیە، کە بێ کەڵکن و فڕێدەدرێن، پارچەی سەرەمقەست. تیژی مقەست و تیغ؛ ئەم سیخە زۆر بەبڕشتە.

**بڕشەهەڵاتن:** تەنگەنەفەس بوون و پیشەهەلاتن لە گەرمان، نان و یا چێشتەکە برشی هەڵێناوە واتا لەبەر کۆنی و یا لە گەرمان کەڕووی هەڵێناوە یا لەبەر بوغ و هەڵم.

**بڕشیا**(فە.): برژاو. (هەورا.) ـــ ی: برژان.

**بڕغی:** بوڕغی.

**بڕفێن:** ڕفێن.

**بڕفێن بڕفێن** (ئەردە.): فڕان فڕان.

**برڤالەک** (باک.): پێشگیرە، بەرهەڵبێنە.

**برڤاندن** (باک.): بریقاندن، تروسکاندن.

**برڤەندەرە** (لو.): چەقەڵ.

**برڤین:** تروسکان، بریقەدان.

**برک:** ژان و برک. ژانی دەمارەکانی لاتەنیشتییە، کە لەبەر سەرمان ڕوودەدا دووای قۆڵنج پەیدا دەبێ چارەی ئارەقەکردن و قوڵنج شکاندنە. (زا.) نەستێر، نەستێرک، کە ئاوی لەبەر نەڕوا با کاتییش بێ (حەوز). بوغ و هەڵمی چاڵاو یا ژوورێکییە، کە هەوای پیس بووبێ. (دەر.) بووخاوە (گیایەکە)، (باک.) حەوز، (زا.) تووڕە، سەرگەرم. پەل، ـــ یکی تێگرت: پەلێکی بۆ ئاوێژت. (ئەردە.) چەلاکێکە، کە بەری دارانی لە لکە بەرزەکانی پێ لێ دەکرێتەوە.

**بڕک** (باد.): قرخێنە، قرقێنە، قرپ. (ڕەوا.، هەو.، دزە.) بڕکەی شووتی و گندۆرە و خەیار و ترێزوو و شەمامە و کوولەکە و نیتر. پارچەداری چکۆلەو بڕاوە بۆ سووتاندنێ وەکوو هی بارەداران. پنجکەدار.

**برکانەوە:** هەڵبڕسکانی شیری.

**برکە:** پەل: برکەیێکی تێگرت، واتا: پەلێکی پێدادا.

**بڕکە:** بڕ، یارەما، (هەورا.) تەرز، (هەو.، دزە.، ڕەوا.) برک، گیایەکە توولە و قۆڵ باوێژێ و بەزەویدا بلاوبێتەوە وەکوو: بڕکەی هاروی، بڕکەی ترێزوو، بڕکەی کالەک، بڕکەی شووتی، بڕکەی گووژاڵک و نیتر، گۆم، گۆل. (ڕۆژ.) بڕکە مەڕ: پارچە مەڕێکی کەمە، کەلە. پللار، پەلار، کوڵەبڕک. گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانییە ئاژاڵان باشی دەخۆن. بڕ، بڕشت، تیکە، بچڕ.

**بڕکەبڕکە** (ڕۆژ.): پارچەپارچەی مێگەلە مەڕان. (هەورا.) ددانە ددانە، (بابا.) دیانەدیانە. کەمکەمە، بڕبڕە.

**بڕکەبۆنخۆشکە:** بۆنخۆشکە (گیا).

**بڕکەمەڕ** (ڕۆژ.): (ڕۆژ.) بڕکە، پارچە مەڕێکی کەمە.

**برکدان:** فڕێدان.

**بڕکردن:** توانایی بەپێ ڕۆیشتن: بەپێ بڕناکەم: بەپێ ناتووانم بڕۆم، گەیشتن، جێ گرتن و پێکهاتنی فەرمان و قسە، جیاکردنەوە، هەڵاواردنی ئاژاڵان و نیتر، دابەشین، کشان، تووانای بوون، ڕێ کردنەوە.

**بڕک کردن:** پەل هاویشتنی پنجە شووتی و گندۆرە و ترێزوو و نیتر.

**بڕکێ** (باک.): جوورە گەمەیەکە.

**بڕگە:** شووێنێکە لەزێ و ڕووباراندا، کە بڕیدات و مرۆ بتوانێ پێیدا بپەڕێتەوە، پاگە. (بابا.، جا.) پلار، پللار. لەلەی قەراخی هەندێ چت.

**بڕگەبڕگە:** چتێکە لە لەی زۆر بێ.

**برم** (فە.): برژ.

**برمانە** (خۆ.، دەر.): (هەورا.) دەنکەنار، دەنکی هەناری ترش بە ئاو و گۆشتەوە ووشک دەکرێتەوە زستانان بەخووێ وە دەیخۆن و لەناو چێشتێشی دەکەن.

**بڕمە:** جوورە شیرینایێکە لە هەویر و شەکر و گووێز دروست دەکرێ. ناڵەی تادار. بڵمە، دەنگی وورچییە.

**بڕمەبڕم:** ناڵەی نۆبەتێ دار، بڵمەبڵم، بۆڵەبۆڵ، ناڵەناڵی تادار. دووانەن و تێراخوڕین بە قسەی قەبەو درشت.

**برم برم** (باک.): دەنگی ووشترییە.

**برمێن**: بەکار و ئازا و بە برشت.*

**برن** (باک.): بردن، هەڵگرتن، گرتن. پێشقە ـــ: بردنەپێشەوە. ـــ سەری: تەواوکردن، بردنەسەر، بەرە: ببە.

**برناخ**: لووت، کونەلووت، تفنک، لە بوونی تورکی وەرگیراوە و کوردی نیە.

**برناخە**: لووت، کونەلووت، ئەوەش لە بوونی توورکی وەرگیراوە.

**برننە**: برندە، تیژ.

**برنج**: دانەوێڵەییێکی سپی و زەرد و ناسراوە و وە گەنمی دەچێ. چەڵتووکی پاککراو، چەند جۆرێکە لە کوردستانێدا. ١) گردەیەنەگازە. ٢) سەدری. ٣) گەرمە: زوورەس. ٤) ساردەدرەنگ پێدەگات ئاوی پاییز دەخواتەوە. ٥) مەولەوی. ٦) عەنبەر. ـــ ی گردە. ـــ ی سەدری، شینایی برنجی.

**برنجاو**: شوورێتی مەرەزە.

**برنجە**: مسی زەرد، پرنج: کانێکی زەردە چتی لێ دادەرێژرێ.

**برنج بەدۆ**: گوونینە، کردۆڵ، چێشتێکە لە برنج و دۆو یا ماستاو دروستدەکرێ وەکوو دۆینە ڕونی بەسەردادەکرێ و گیای تێ ناکرێ.

**برنج بەشیر**: شیربرنج.

**برنج چێن**: کەراخ.

**برنج کوت**: کەسێکە بە پارە برنجی بۆ ئەم و ئەو بکوتێ بە دنک یا بە ئاش.

**برنجۆک**: تەنراو و چنراوێکی تەنک و کونکونە ژنان دەیکەن بە کراس و دەسماڵ.

**برنچە**: مسی زەرد.

**برندە**: برێن، بڕ، برۆک، ببڕ، تیژ، تیغێکە برندە بێ.

**برنک**: کەلەخ، مقەستێکی زۆر گەورەیە ئاژاڵی پێ دەبڕنەوە، جەوی ئاژاڵ بڕینەوە.

**برنکە**: برنک.

**برنگدان** (ئەردە.): فڕێدان.

**برنووتی**: دەرمانێکە لەگەڵ تۆزی توو تنی لە لووت دەکرێ بۆ پشمین، ووشەیەکی تورکییە.

**برۆ**: بوورو، (باک.) هەرە، (فە.) بوورِیە، برِوو، (ژا.) بشۆ، (زا.) برِی، (هەورا.) بلۆ، لووە. بچە، بچوو، بچۆ، هەرۆ، لووە، هولوو، (شوا.) ڕۆورێ، فەرمان و تێراخوڕینە بۆ یەکێکی ئامادە تا بڕوا.

**برۆ**: (بۆتا.) بروە، (باک.) برە، (سوور.) بریی، (باک.) برو، ڕێزە موویەکی کەوانەدارە بەسەر کالانەی چاوەوە. جوورە ماسیەکە.

**برۆک**: ددانەکانی پێشەوەن چووار لە سەرێ چووار لە خوارێ.

**بروو** (باک.): برۆ. قامیش. گەرمەژان، دەردوئێشی منداڵبوونێیە.

**بڕوا**: باوەڕی، بەقا، بایەخ، باوەڕ. ـــ کردن: باوەڕکردن. بڕوانە، تەماشاکە.

**بروواژی** (شەم.): بەروازی، ئاوەژوو.

**بڕوانە**: بنۆڕە، بنووارِە، تەماشاکە.

**بروبیتای** (باک.): بەرامبەری، بەربەرەکانی.

**برۆپەیوەس**: برۆپەیوەست.

**بڕوای**: باوەڕی، ئارەزوو، کرانەوە؛ دڵم ـــ نادا بچمە ماڵی بەهەشتی واتا دڵم ناکرێتەوە یا مەیدان نادات.

**برووز سەندن**: زۆر بوون، چڕەبوون.

**برووساندن** (باک.): پڕیشک ئاوێژتنی ئاوور، تروسکەدان.

**برووسک**: کەم. ـــ ێکم ئاویدەیە: کەمێکم ئاو بدەیە.

**برووسک**: ئاورێکە لە کاتی لێکدانی دووپارچە هەوراندا لە زەوی دەدا. شمشەی برووسک: تیرێژ، ئادارەی برووسکێ، (باک.) بەلەدی. چەنی بروسکێ، (باک.) بلێچ. نێوی نێرینانە.

**برووسکاندن**: برووسکین، برووسکەدان.

**برووسکانەوە**: تروسکانەوەی هەندێ چتە لە دوورەوە.

**برووسکە**: تروسکە. هەورە تریشقە، هەورەتریشکە. برووسک، چەخماخە و ئاگرێکە لە هەور یا لە وێککەوتنی دووچت پەیدا دەبێ. تەلگراف.

**برووسکەدار**: تروسکەدار، (باک.) برەووش، (ئاو.) خشەنیتە، بریقەدار. ـــ ی: بریقەداری، بریسکەداری.

**برووسکەدان**: چەخماخەدانی هەور. سەرهەڵدانی ئازارێکی کت و پڕ و تیژە.

**برووسکیان** (ئەردە.): برووسکەدان، ئێشان، برووسکاندن. چەخماخە وەشاندن، برووسکەدان.

**برووسکین** (باک.): برووسکاندن.

**برووسین** (باک.): پڕیشکدان، درەخشان.

**برۆش** (باک.): شیرازە، بندروو. ـــ کرن: شیرازەکردن. غارا، زۆر بەز. (زا.) بەرۆش، دیزە، دەستمەنجەل.

**برۆش**: بڕوێش.

**برۆشکەخەو** (هەورا.): خەوەکوتکە.

**بڕووش**: بڕوێش.

**برووش** (باک.): سەرخۆش، گێژ.

**برووغ** (باک.): بەفیز، فیزدار، بەهەوا. ـــ ی: فیزداری، هەوا، فیز.

**برۆک** (خۆ.): هەشت ددانەکانی پێشەوەن چوواریان لەسەرەوە و چوواریشیان لە خووارەوەن لە نێوانی دڕۆکێ دان. برندە، بڕ، بڕێن، ببڕ.

**برۆقەیتان**: برۆی وەکوو قەیتان باریک.

**برووکان** (بابا.): برووکانەوە، درەوشان، وورشەدان.

**برووکانەوە**: درەوشانەوە، وورشەدان، تروسکانەوە، پرووکان.

**برووکە**: ڕەوشەن، رووناک.

**برۆکەوان**: برۆ چەماوە وەکوو کەوان.

**برۆکی خووارەوە**: کانکەر.

**برۆی** (هەورا.): برۆ.

**برۆیش**: قڵۆشە، (هەورا.) هوڵۆشە. (دەر.) هورووش، وولۆشە، برۆش.

**برۆیش کردن**: ئاخۆتنی پڕ هەڵە؛ بارام کەوتە برۆیشکردن، واتە کەوتە قسەی پڕو پووچ و بێ سەروپێ، مووکردن.

**بروێشین** (ئەردە.): چێشتی بروێشی.

**بروێن:** ئاژووەر، شۆفێر.

**بروێی:** بروایی.

**برە:** جوورە ماسییەکی دەریاییە. برۆ.

**برە** (باک.): هێز، زەبر، تین.

**برهاف** (باک.): کۆ. ـــ کردن: کۆکردنەوە.

**برهان** (باد.): برژیان.

**برهەک** (باک.): مشار.

**برهۆک** (باک.): مشار.

**برهین** (باک.): برین.

**برێ:** گۆترە، برە، نەختێ.

**برێ:** خۆزگە، بریا. لەبرێ چوون. پتر برژان: هێلکەکە لەـــ چووە ئەوەندە برژاوە.

**بری:** تامەزرۆیی، تامەزرۆ، تینوێتی. ـــ م شکا: تامەزرۆییم شکا. ـــ ناشکێ: تامەزرۆی ناشکێ.

**بری:** بریا.

**بریی:** برێتی، خۆزگە، بریا، کاشکی. بات، جیات، لە ـــ: لەباتی، لەجیاتی. (زا.) برۆ.

**بریا:** مرازی ئاواتخوازتنە. خۆزگە، بری، بریێ، بریان، (خۆ.) خۆزی، برێ، بریکەنێ، کاش، کاشکی، بری: بری بەبری خوای بایە؛ بریا کوردستان بوویایەوە یەکپارچە.

**بریار:** بەڵێن و چلۆنی و شێوەی کڕین و فرۆشتن. چەشنی برینی بەرگ. تیغی ـــ: تیغی برندە. لە مەجازدا بۆ مرۆڤانیش بەکار دەبرێ.

**بریاگ:** براو، بردراو. ـــ دان: لێ بران، لێ بزربوون، هەرێ کردن.

**بریان:** بریانی، گۆشتی برژاو و یا سوورکراوەوە. ـــ کردن: گۆشتەکردنە بریانی لە ئاوزگی مریشک یا بەرخ باخنرێ و لە ڕۆنیدا سوورکرێتەوە. بردران.

**بریان:** پسان، بران، پچڕان، پچەڕان، پروسقیان.

**بریانەوە** (هەورا.): برانەوە، لەت بوون، پسان، برینەوەی ئاژاڵ، دوایی هاتن.

**بریاندنەوە** (هەورا.): براندنەوە.

**بریانی:** نێوزگی مریشک، یا قەلەموونە و یان بەرخی پڕەدەکەن لە برنج و کشمیش و بادام و لە نێو مەنجەڵیدا دەیکوڵێنن. گۆشتی برژاو یا سوورکراوەوە.

**بریو** (هەورا.): براو.

**بریە:** گۆترە، بڕیار، دەمبڕ، گۆترمە، تەی، بڕە، مختە. لە ـــ: لەگۆترە. پەیمان، بەڵێنی. ـــ دان: پەیمان و بەڵێنی دان، بڕیار.

**بریەی** (هەورا.): برین.

**بریێتی** (جا.): لەبری، لەبرێتی. جیات، باتی، بریتی، وەجعێ، وەج.

**بریخە:** بریقە. یەخەیەکە بۆ قایی لە دیوی ژووڕەوەی ئێخەی کراسی دەدروێ.

**برێژ:** ڕێژندە، داڕێژەر. قاڵبێکە چتی شل و یا تواوەی تێدا داپڕێژرێ.

**برێژەوەدان** (ڕژ.): گۆشتی لە نێورۆنیدا سوورکردنەوە.

**برێژنای** (هەورا.): برژاندن.

**برێژیا** (هەورا.): برژاو.

**برێژیای:** (هەورا.) برژان.

**برێسبرێس:** سمرسمر.

**بریسک:** بریسکە، تروسکەی شیری.

**بریسکانەوە:** تروسکانەوە، (ئاو.) خشا.

**بریسکاندنەوە:** بریقاندنەوە.

**بریسکە:** ترووسکەی ئاووشووشە و تیغ و نیتر، کە خۆر لێی بدا.

**بریسکەبریسک:** ترووسکەی یەک لەدوای یەکتری.

**بریسکەدانەوە:** ترووسکەدانەوە، تیشک دانەوەی شووشە و چتی لووس و روون لەبەر خۆر.

**بریسکەر:** ترووسکەدەر، شەبەقدەر.

**بریسک و هۆڕ:** بریسکەبریسکی زۆر.

**برێش** (ئەردە.): بروێش.

**برێشت** (ئەردە.): برینی کاڵا. بریار: ئەو کەوایە ـــ ی جوانە: بریاری جوانە. برشت.

**برێشتە** (هەورا.): برژاو.

**برێشتەی** (هەورا.): برژان.

**برێشکە:** (ئەردە.) دانە. قەلینۆک، برێشک. دانەوێڵەی برژاو لەسەر ساج.

**برێشگە:** برێشکە.

**برێف** (باک.): ئاگادار، ووشیار.

**برێف** (باد.): تووکی بەری مرۆڤانە.

**بریفا:** ناوی دوونێلی کوردن یەکێکیان لە ناو دەقۆریا لە هێڵی ئاموودە و یەکێکیش لە ژووررووی بازاڕی ستەورییە.

**بریفان** (باک.): ووشیاربوون، ئاگاداری کردن. ترووسکان، برقان.

**بریقانەوە:** ترووسکانەوە، بریقەدانەوە.

**بریقاندن:** ترووسکاندن، برقاندن.

**بریقە:** بریکە، وریشە، ورووشە، برووسکە، ترووسکە، درەوشانەوەی شووشە و ئاوێنە و چتی تر لەبەر هەتاو و چرا.

**بریقەدانەوە:** برووسکانەوە، چریسکانەوە.

**بریقەبریق:** تروسکەی یەک لە دووای یەکتری، ترووسکەترووسک، بریسکەبریسک.

**بریقەدار:** بروسکەدار، تریسکەدار، چریسکەدار. ـــ ی: برووسکەداری.

**بریقەدانەوە:** تروسکانەوەی ئاوێنە و یا شووشە و چتی تر لەبەر هەتاو و چرا.

**بریق و باق** (ڕژ.): (موک.) شەبەق، وەکوو ڕووناکی ئاوێنە لەبەر تاوێ بدرێتە دەرەوە.

**بریق وهۆڕ:** تروسکەتروسکی زۆر.

**بریک:** ئافتاوە، لوولینە.

**بریکان:** تروسکان، برقان.

**بریکاندن:** تروسکاندن، برقاندن.

**بریکە** (ئەردە.): بریسکە.

**بریکەنێ:** بریا.

**برێکە:** تاوێکە، ماوەییێکە.

**بڕێن:** بڕندە، بڕ، ببڕ، بڕۆک.

**برین:** (کە.، زەن.) زام. زەخم، (هەورا.) ڕیش. (باک.) قەشفووس، کۆڤان، کوول.

**بڕێن:** بڕینک، بڕەوە، ببڕ.

**بڕین:** بەمشار و چەقۆ و چتی تیژ دار و چتی تر دەبڕێتەوە، پساندن، پچڕین، کوتکردن، پەلکردن، قەدکردن، پارچەکردن، کەرتکردن، برهین، تەرەفاندن، (باک.) بڕاندن، قەتاندن، قەژیلاندن، ژێکرن، قەڵەمکردن. بڕشتی دە غڵ و دان و میوە و ئیتر.

**بڕین:** ووتوو وێژ بڕینەوە: کۆتایی پێدان. هەنگوین لە شانە دەرهێنان. لە(ڕیان) مەوە: ئێمە گوو بکەین. ڕێگابڕین، ڕۆیشتن. جلک ـــ: بڕینی پۆشاک.

**برینە:** برنگی ئاژاڵ بڕینەوە. ژانگرتنی ئافرەتە لەکاتی منداڵ بوونیدا.

**بڕێنە:** بڕینەوەی مەڕ و بزن، پاچینەوەی مەڕ و بزن.

**بڕێنەچی** (ڕۆژ.): برینگچی، ئەو کەسەیە ئاژاڵان دەبڕێتەوە.

**بڕینــەوە:** بڕینی دار و کوتاڵ و باخ و باغچان دورکەرت یا چەند پارچەکردن. بڕینەوەی ئاژاڵان واتا خوریی مەڕ و مووی بزنان بە برینگ لێ کردنەوە. ـــ ی قسە: کوتایی پێدان، دوایی پێهێنان. گرتنەوەی ساوا لە مژینی شیری دایکی. پایەداری، مانگانە یا ڕۆژانە و یا سەودا بڕینەوە (دیاری کردن). منداڵ لە شیری گرتنەوە. پچڕین، پچەڕین، پارچەکردن.

**برین پێچ:** ئەوەی برین تیماردەکات و دەیپێچێ.

**بریندار:** زینبری، زامدار، زەخمدار، زامار، کۆڤاندار. ـــ بوون: زامداربوون. ـــ کردن: زامدارکردن. بە چتی تازە و ساخیش دەڵێن، کە کونی تێ بووبێ و یا خەوشێکی لێ پەیدا بووبێ.

**برینداری:** زامداری، زەخمداری، زاماری، (هەر.) گیایەکە لە ژاژی دەکرێ.

**بریندەس** (ڕۆژ.): گیایەکی بۆنخۆشە شوانکارە لە نێو هیزە و مەشکەی دەنێن.

**برینــگ:** (دزە.) جەوبڕ. (ڕۆژ.) چارە، چارگ. (باک.) کەلەخ، هەڤەنک، (ئەردە.) بڕێن، هەورێنک. ـــ ی ئاژاڵ بڕینەوە، مقەستێکی گەورە و تایبەتییە بۆ بڕینەوەی مووی بزن و خوری سپیان. ووشک، ئیشک و برینگ.

**برینگە:** برینگ.

**برینگەوان:** جەوکار، جەوکەر، بڕێنەچی. ـــ ی: جەوکاری.

**برینگچی:** برینگەوان، (ڕۆژ.) بڕێنەچی، جەوکەر.

**برینگچێتی:** جەوکەری.

**بریو:** دەنگ، هەڵڵا، قریشتە، گرمە.

**بریوان:** (مرک.) بڵیمان. ئەو تەڕاییەیە، کە بە بێچووانەوە دەبینرێ دووای بوونیان.

**بریوبریو:** دەنگەدەنگ، هەڵڵاهەڵڵا، قریشتەقریشت، گرمەگرم.

**بز** (باک.، شووا.): بزن. (پر.) بزە، جوورە ماسییەکی گەورەیە. (کۆ.، کە.) چووز. ـــ دان: چووز پێوەکردن. زەق، چاوبز: چاوزەق، چاوی داپچڕاو. بەسووکی تەماشاکردن، چاو ـــ دان، بزدان. کێڕێکە لە یاری بزێندا دەکێشرێ.

**بزانتشتر** (باک.): نێری سێ ساڵانەیە.

**بزاستر** (باک.): نێری سێ ساڵانەیە.

**بزافتن:** بزاوتن.

**بزاڤ** (باد.): بزۆز، جووڵە (بۆ مرۆ) ـــ بوون یا ـــ کرن: جووڵان

**بزاڤتن:** جووڵاندن، بزاوتن.

**بزاڤکرن:** جووڵاندن، بزواندن. جووڵانەوە، بزووتنەوە.

**بزان:** زانا، بەسەلیقە، شارەزا، زانیار، بزیو.

**بزاوتن:** جووڵاندن، بزواندن.

**بزاووز** (خۆ.): جووڵە، جووڵەجووڵە، جووڵان.

**بــزە:** زەردە، زەردەخەنــە، نەرمەپێکەنین، زەقەی چاو، پێکەنینێکی سووکترە لە زەردەخەنە ددان دەر ناکەوێ. ـــ ی خستە سەر لێوان: لەسەر لێوەکانیەوە بزە خۆی نوواند. (هەورا.، شەم.) بزن. (کۆ.، پر.) جوورە ماسییەکە سمێڵی هەیە و چاویشی زەردە، (کۆ.) چاونێرگ. ترووکە: بزە.

**بزەبز:** زەقەزەقی چاوی پێدەکەنێ.

**بزەپشتیر** (باک.): بزنی سێ ساڵانەیە و مەڕی چووار ساڵانەیە.

**بزەفتن:** بزووتن.

**بزەکردن:** پێکەنینی بێ دەنگ.

**بزەکووی** (هەورا.): بزنەکێوی.

بزەکووی

**بزەگرتن:** بزەکردن.

**بزەڵە:** کوودەڵە بەراز، فەرخەییێکە، کە لەخۆیدا هاتبێ و گەورە بووبێ. ـــ بوون: گەورەبوون.

**بزەلەڕ:** بزنەلەڕ.

**بزەن:** مرۆی ئازا و ولێهاتوو، لێدەر، بکوژ.

**بزەن بەهەلوڕ:** بلوویربەزێن.

**بزەنگ** (باک.): جوورە گەنمێکە.

**بزبزۆک:** چاوبزۆک، چاوبز، چاوزەق، کەسێکە چاوی بزبچێتەوە. بزۆز. ناوکی بەری داری قەرەقاجییە، کە داری قەرەقاج کەژۆکی دەگرێت.

**بزبزۆکە** (هەورا.): ویزوویزە.

**بزپێوەکردن** (بابا.): چووز پێوەکردن، قامک بۆلای قوونی یەکێکی بردن بەگاڵتە، گاڵتەپێکردن؛ بزی پێوەمەکە: گاڵتەی پێ مەکە.

**بزد** (باک.): ترس.

**بزدان** (کە.، کۆ.): چووز پێوەکردن. (باک.) ترسان؛ بزبدە: بترسێ. گەمە و گاڵتە و تیز پێکردن. پسان، پچڕان.

**بزداندن** (باد.): پساندن، پچەڕاندن. (باک.) ترساندن، (باک.) بزدهاندن.

**بزدۆک** (باک.): ترسەنۆک.

**بزدۆنەک** (باک.): ترسەنۆک.

**بزدهان** (باک.): ترسان.

**بزدهاندن** (باک.): ترساندن.

**بزدین** (باد.): پسان، بەزدین.

**بزر**: ورن، (هەورا.) گوم. پەنهان، شاراوە، شاردراوەوە، بێ سەروشوێن. ـــ بوون: ونبوون، پەنهان بوون، گوم بوون. ـــ کردن: شاردنەوە، لەناوبردن، گوم کردن. (باک.) تۆکەتان، ڕۆنی کەتانی.

**بزراڤ** (باک.): ئازا.

**بزران**: تاسان.

**بزراندن**: تاساندن.

**بزڕیزڕ**: چتێکە کوڵۆکوڵۆ و گرۆگرۆ بووەستێ وەک ڕۆن دووگ.

**بزرقیا** (هەورا.): بزڕکاو.

**بزرقیان** (هەورا.)بزڕکان.

**بزڕکان**: ڕەنگ گۆڕان، هەڵبزڕکان، (دەر.) هەڵبڕکیان، هەڵگەڕانی شیر، تێکچوونی شیر و ماست و ئیتر کەوا کوڵۆکوڵۆ و گرۆگرۆ دەوەستێ و دەبێتە ئاو و بزڕیزڕ بوونی. تێکچوون و شێوانی گیاندار لە ترسان.

**بزڕکاندن**: هەڵگەڕاندن، ووڕێنەکردن.

**بزڕکاو**: هەڵبزڕکاو، پچکاو، (دەر.) هەڵبڕکیاو، بۆشیر و ڕەنگی مرۆڤ و ووتەی ناخۆش. شڵەژاو، تێکچوو.

**بزرکردن**: گومکردن، ونکردن. (زا.) خۆ هەنوون بە ڕۆنی کەتانی.

**بزرکرن**: بڕوانە: بزرکردن.

**بزرۆک** (زا.): زیپکە.

**بزری**: ونی، گومی، نەدیوی. (باک.) جوورە ماسییەکە.

**بزڤاندن** (باک.): بزواندن، هاندان.

**بزڤانۆ** (باک.): هاندەر.

**بزڤانۆک** (باک.): هاندەر.

**بزڤین** (باک.): بزووتن.

**بزگ** (ئەردە.): پزووی دەرپێ. شیلاتی سوورە، کە ژنان لە ملیانی دەکەن، مەرجان.

**بزگەل**: بزنەگەل، گەلەی بزن.

**بزگوڕ**: کەل و پەلی ناوماڵ و هی ناو دوکانێ. چەند پارچە چیت و شڕوشالاتێکە، کە بۆ جل و بەرگ بیکەن یا کڕیبێتیان. پەڕۆی کۆن و شڕوشالات، ڕیندۆڵ، تیتۆڵ. پوولی بێ نرخ: ـ ێکم پێ نیە.

**بزگیر**: ڕژد.

**بزگیلە** (ئەردە.): بووکێکە لەناو پەردەدا بێ. گیایەکی بەهارییە بۆ زۆر دەرمانان بەکاردەبرێ.

**بزڵە** (هەورا.): کاریلەی گچکە، کارژۆڵە، کار.

**بزڵەبەراز** (هەورا.): کوودەڵە بەراز، بیۆڵە.

**بزڵەمەجی**: جوورە کولێرەیەکە لە پێشدا دەخرێتە سەر ساج تا نیوە برژ دەبێ ئەو جار دەیخەنە سەر مادە (ڕفێدە) و دیوەکەی دیکەی بە قاپی بەسەر ساجەکەدا دەدرێ. داڕژتنی ووشەکە تورکییە و کوردی نیە.

**بزماتە**: قرماغی برین، توویژی ئەستووری سەربرین، بزمەتە.

**بزمار**: بسمار، مرازێکی دیارە، مێخی ئاسن.

**بزمارە**: وورده پووازێکە لە گێر (بلۆسک)ی ئاشی دەدرێ تا نەمیزێ، (ئەردە.) مێخەکە.

بزمار

**بزمارڕێژ**: چتێکە بزماری زۆر لێدرابێ.

**بزمارکوت**: شوێن و یا بن پێڵاوێکە، کە بزماری زۆر تێکوترابێ. ترێیە هێشووی پڕگلووبێ.

**بزمارۆک**: بزمەتە، قەتماغەی برین.

**بزمان** (باک.): بەزمان.

**بزمەتە**: بزمانە.

**بزمژگ** (باک.): بزن مژک.

**بزمک** (باک.، موک.): بزمۆک، بلامک، بەلامک.

**بزمۆک** (ڕەوا.، خۆ.، سوور.): لەڕولاواز. (باک.، موک.) بزمک، (دەر.) بەلامک، زاریێن، دەمگووش، بزمۆکە. جوورە لغاوێکە لە دار و بەنی دروستدەکرێ لە زاری بەرخ و گوێلکانی دەکەن تا دایکیان نەمژن، بەلان پەکی خواردن و خواردنەوەیان ناخات.

**بزمۆکە**: بزمۆک.

**بزن**: کاریلەی سێ ساڵانە، کە چووار بەهاران ببینێ دەبێتە بزن، (هەورا.، باک.) بز، (هەورا.، شەبە.) بزە، (هەورا.، لو.) بووزە، گدێ، (باک.) پەزی ڕەش، بزنە قسر: جووێشتیر.

بزن

**بزنانە**: شاخانە، پووشانە. جوورە خەرج و باجێکە لە لایەن میری یا ئاغاوە لە خاوەند بزن دەستێنرێ. چل یەکی ئاژالانە، کە لە لایەن میرییەوە لە خاوەندەکەی دەستێنرێ.

**بزنەپۆش**: بزنێکە گوێی شۆڕ و درێژبێ.

**بزنە دۆخە**: بزنێکە بۆ دۆو خووری و بەرەکەی بدرێ بە کەسێکی بەو مەرجە، کە لە دووایییدا تەنها بزنەکە بەساخی بدرێتەوە ماڵخۆی. لەهەندێک شوێندا بەزاوی بەکارەوە دەدرێ بە ماڵە ئاغایە یەکێکی تر کە دۆیەکەی بخۆن بەلان، کە ووشکی کرد بزنەکە بە کارەوە دەدرێتەوە بە ماڵخۆی.

**بزنەڕیشە**: گیایەکی بەهارییە، گەڵای وەک کەوەر وایە، بنجێکی بچووکی هەیە گوڵێکی شینکاری هەیە.

**بزنەسپی ڕووت**: بزنێکە سپییێکی تەواوبێ.

**بزنەسیس** (خۆ.): بزنەکەژ.

**بزنەشاخدار**: بزنێکە شاخی هەبێ.

**بزنەقوت**: بزنێکە گوێی قوت بێ.

**بزنە قول** (خۆ.): بزنێکە ڕەش بێ.

**بزنەکەڕێ**: بزنێکە گوێی بچووک و قوت بێ.

**بزنەکەژ** (خۆ.): بزنێکە ڕەنگی سپی بێ، بەلاّن بە زەردی بنوێنێ، (خۆ.) بزنە سیس.

**بزنەکوڕانە:** بزنێکە هەموو ماڵە ژێر دەستێک دەینێرن بۆماڵی ئاغا هەر کاتێکی کوڕی بێ.

**بزنەکۆڵ:** بزنی بێ شاخ.

**بزنەکێفی:** بزنەکێوی.

**بزنەکێوی:** (باک.) پەزکوڤ. بزنەکێفی، وەک ئاسک وایە بەلاّم شاخەکانی لکلکن.

**بزنەگەل:** بزنەل.

**بزنەڵ:** بزنەگەڵ.

**بزنەمەرەز:** بزنێکە تووکی درێژ و نەرم و ڕەنگی جووراوجووری هەیە، (باک.) چوور.

**بزنەوان:** شووانی بزنان.

**بزنەوەس:** مەشکەیەکە لە پێستی بزن دروستکرابێ.

**بزنەهەمس:** بزنێکە دەم و قەپۆزی سوورکاربێ.

**بزن بزنانێ:** قۆچقۆچانێ، قۆچ لێدانێ، جوورە گەمەیێکی مندالاّنە.

**بزن تڕێنە** (بلّ.): چڵە گیایەکە دوو بست بڵند و گەلاّی وەک کەوەر وایە سێ کەڵی دەردەکات و هەر یەکەی گوڵێکی ڕەنگاو ڕەنگ دەردەکات بنەکەی خڕە وە پیوازێکی گچکە دەچێ، کە بزن بیخوا لەبەر تیژی ڕاوێڵێ.

**بزنەلەڕ** (دەر.): (زەن.) بزن مێرگ، باڵندەیێکی بۆری گەورەیە وەکوو قازی وایە گۆشتی دەخورێ، بزلەڕ.

**بزن مژ:** بڕوانە: بزن مژە.

**بزن مژە:** شینشینک، (بابا.) قۆڕی، قومقومە، قومقومۆک، بزن مژ، بزن مژۆک، بزن مژک، بزن مژک، (بلّ.، موک.) بزن مشک، زیندەوارێکە لە چەشنی مارمیلکەی و هێندەی پشیلەیێکی گەورەیە بێ تووکە پێستەکەی دەکەنە ڕووکێشی کالانی خەنجەر و شیری و چنگی وە چنگی منداڵی دەچێ. ـــ لە ڕووی ئەوەوە بزنان دەمژێ ناونراوە بزن مژە.

**بزن مژەک:** بزن مژە.

**بزن مشک:** بزن مژە.

**بزن مێرگ** (زەن.): باڵندەیێکە وە لەگلەکی دەچێ بەلاّن لەش و دندووک و پێی ڕەشە، (دەر.) بزن لەڕ.

**بزنێری:** گیایەکی بەهاری و کوێستانییە گوڵێکی سپی واشی هەیە.

**بزۆ** (باک.): بووز، دار حەیزەران.

**بزوو:** بڕوانە: بزۆ، (زا.) داری بی.

**بزووان:** جولاّن.

**بزواندن:** بزاوتن، جماندن، جەمچقاندن، چەلقاندن، چەلکاندن، بزوێندن، (باک.)بزڤاندن. هاندان، فیتدان.

**بزواندنەوە:** جوولاّندنەوە، هۆژاندنەوە.

**بزۆت:** (دەر.، هەورا.) سەلکەبزۆت، (زەن.) پەلەبزووت، نیمەسۆز، (هەورا.) سەرچلۆسک.

**بزووت:** بزۆت.

**بزووتک:** بزووت.

**بزووتن:** جوولاّن، جوولاّنەوە، جمان، جوومان، (لک.، لو.) ئاخێزکردن، جەمچقین، لیان، (ڕۆژ.) جمین، وەرزین، چەلقین، چەلکین، (باک.) لەبتین، بزڤان، جەمین، هۆژان. ـــ ی مەمک: جمان، جومان، هاتنەخووارەوەی شیرە لە مەمکی بۆ منداڵی.

**بزووتنەوە:** بزاڤکرن، بزاڤ بوون، جوولاّنەوە، جڤین، هۆژانەوە. سەرکەوتنی نرخی چت. پتربوونی ئاو.

**بزۆز:** سەربزێو، تۆلاز،دەست بزێو، چارقاپ، حالۆرە، بزێناوێ، تۆسن، تۆلاز، بزاڤ، جەربەزە، جرپن، بزۆک، هەلکۆ، بزێو، (باک.) کرمی پەنیری کۆن، قەشقە، قەشکە، مۆرانە، زیندەوار، جرجانەوەر. ـــ ی: تۆسنی، تۆلازی، بزۆکی، جرپنی.

**بزووژن** (ڕەوا.، هەو.): سووژن.

**بزۆک** (باک.): جوورەدارێکە. بزێو، بزۆز. گیانلەبەرێکە زۆر زگ و زا بکا و هەموو ساڵێکی بزێ.

**بزووک** (ئەردە.): بزۆز، بزێو.

**بزۆکی:** بزۆزی، جرپنی.

**بزۆێن:** جوولێنەر، جوولێن، (باک.) بزڤانۆ، هەلکۆ. سەر و بۆر و ژێر لە ڕستەسازیدا. هاندەر.

**بزۆێنە:** سەر و بۆر و ژێر لە ڕستەسازی ئارەبیدا.

**بزوێندن:** بزواندن.

**بزێیزی:** گیایەکی بەهارییە کوێستانییە سێ چووار لق دەردەکات گوڵێکی سپییات دەگرێ.

**بزێر** (باک.): زێڕن، زێڕین.

**بزیسک:** پزیسک.

**بزیشک:** پژیشک.

**بزیڤ** (باک.): زێوین.

**بزێن:** جوورە گەمەیەکی منداڵانەیە، گێرێکی گرد (جغزێکی خڕ) دەکێشن یەکێکیان دەچێتە ناویەوە و ئەوانی دیکەش تێی هەڵدەدەن.

**بزێناوی:** بزۆز.

**بزێو:** بزۆز، کەسێکە، کە زۆر بجوولێ.

**بزێونە:** بزوێنە.

**بزێوی:** بزۆزی.

**بزیی:** ڕەشە وولاّخێکە، کە پێی نابێتە سێ چووار ساڵییەوە.

**بژ** (باد.): بێجگە، جگە، بێ لە. ـــ لوی: بێجگە لەوی. (هەو.) قەڵچغە باریکەکانی گوڵەگەنم و جۆ و گوڵە پێغەمبەرە و ئیتر. لق و پۆپی داران. ـــ ی: تووکێکی درێژە بە نێوچاوانی وولاّخانەوە و بە یاڵیشیان دەڵێن ـــ. مووی گیڤ، پژ.

**بژار:** ئەژمار، (دەر.) ووژار، (باک.) ئادە، ئەشێف، (هەورا.) کشکە، ووجز، (هەو.) تەلبیش. ـــ کردن: هەڵبژاردن، ئادەکرن. پاک کردنەوەی باخ و باخچان لەو گیایانەی، کە زیانیان پێدەگەیەنێ. دزین، خوراندن.

**بژارە:** دزین، خوراندن. هەڵبژاردە، بژاردە. ـــ کردن: هەڵبژاردن، ژماردن. ڕاستکردنەوەی ڕایەڵی جۆلاّ، کە پاش و پێش بکەوێ. تاوان، بژاردە.

**بژارەکردن:** خەوزڕان و خەیاڵکردن لەبەر مەراقێک: من ئەمشەو تا بەیانی هەر لە ـــ بووم. هەڵبژاردن، ژماردن.

**بژاربڕ:** بژارچن.

**بژارتن** (باک.): بژاردن، هەڵبژاردن، بژاردنی دانەوێڵە.

**بژارتۆ** (باک.): بژاردە، ژماردە.

**بژارتی** (باد.): برژاو.

**بژارچن:** (کۆ.) بژارکۆڵ. (باک.) ئادژدە، ئادوودە، بژاربڕ، (هەورا.) گلیچ، ناوکەت، بژارکەر، ـــ ی گچکە: گلچک.

**بژاردە:** دەستەچن، هەڵبژاردە، هەڵبژێرراو، پەسندکراو.

**بژاردە:** هەڵبژاردە، دانسقە، دەستبژێر، دەست ئەژمێر، (باک.) بژارتۆ، هەڵبژێردراو، سەرگوڵ، سەرتۆپ، ووژانە.

**بژاردنەوە:** دووبارە بژاردنی چتێکی. گێڕانەوەی خەون.

**بژاردن:** ئەژماردن، (باک.) بژارتن. ووژاندن، ژماردن. هەڵبژاردن، دەستە ژمێری. بۆ ـــ: تۆڵەی زیان دانەوە. پێ ـــ: پێ دانان، تۆڵەی زیان لێکردنەوە. پاکردنەوەی ووشکە دانەوێڵە لە زیوان و ئیتر.

**بژارکەر:** کرێکار و کەسێکە هەر بژاری بکات.

**بژارکردن:** خاوێن کردنەوەی شیناییە لە گژ و گیای بێگانە و بێ سوود. دزڕین، خوراندن.

**بژاڵ:** هەژگ و پژاڵ.

**بژانک** (باک.): کەرەستەی ڕازانەوەی ژنان.

**بژانگ:** ڕێزە مووی سەرپێڵووی چاوانە. مژۆڵ. قەلداس. پشووی چت. خۆدزڕین.

**بژاندن:** برژاندن. هەڵبژاردن.

**بژە** (جا.): کەسێکە کەچەڵ و سەیر و زۆرزان و عەیار و شەیتان بێت. (بل.) بەش، پش، پشک. ئەو نەختە هەنگوینەیە، کە دووای بڕینەوەی بۆ هەنگانی لە نێو خەڵفەکەدا دەهێڵنەوە.

**بژبژە:** پەسپەسەکۆڵە، پەسپەسەکۆڵە، جاڵجاڵۆکە.

**بژشک:** پزیشک، پزشک. ـــ ی: پزشکی.

**بژن:** ژندار، خاوەندژن.

**بژنک** (باک.): پزیشکی ئاور ئاوورییە، پرشنگی ئاو و بەردە لە کاتی شکاندنیدا.

**بژنیاگ** (ئەردە.): هەڵبژێردراو، بژاردە، پەسندکراو.

**بژنین** (ئەردە.): هەڵبژاردن، پەسندکردن. بژارکردن، پاک کردنەوە.

**بژووژن** (زا.): سووژن.

**بژۆل** (شا.): مژۆڵ.

**بژوولک** (باد.، بار.): مژۆڵ، برژان.

**بژۆن:** بەشارەت، وورە، توانا، زەهلە، کۆکی. لاوچاک، جووان.

**بژوون:** کۆک، پۆشتە، ئازا، (باک.) جل و بەرگ و لەشی خاوێن. (خۆ.) گووارا، سازگار، جووان، تەندروستی، سوودمەند بۆ لەش. ـــ ی: پۆشتەیی، سازگاری، جووانی، تەندروستێتی.

**بژووین:** پاک، خاوێن.

**بژوێن:** جێگایەکی بۆ مرۆ و ئاژاڵان باشبێ و ژیانی تێدا چاک بگوزەرێت. لەوەڕی زۆر و زەوەند.

**بژی** (باک.): بمێنە، هەربژی بە ژیانێکی تەندروستی و سەربەرزی. بژی وولاخ: یاڵ. ـــ گیایان: لیف. (هەو.) قەڵچغە باریکەکانی سەری گوڵەگەنم و جۆیە، قەلداس، (موک.) داسوو.

**بژیاگ** (ئەردە.): بژاردە، هەڵبژێردراو، پەسندکراو.

**بژیان** (باک.): ئارەزووکردن، ببژە: ئارەزوویکە.

**بژی بژی:** گۆڵەگۆڵە، گوورێلکی پێ بانگ دەکرێ.

**بژیر:** زیرەک، ووریا، بژار، بژاری بێستان و ئیدیکە.

**بژێردراو:** ئەژمێردراو.

**بژێلک** (سوور.): مژۆڵ.

**بژین:** (سوور.) لەکاتی ئافەرین و شاباشیدا بەکاردەبرێ، بۆ گەلە. (باو.) پاک و خاوێن، جووان، (باد.) بژوون. ساخ و تەندروست بوون.

**بژێو:** خووراردەمەنییێکە، کە هۆی ژیانی مەردومی بێت.

**بژیو:** ژی، ژیوار، گوزەران، زیندەگانی.

**بژیی:** هەربژی بە ژیانێکی خۆش و بەختەوەرانە. چەند موویەکە لە پێش نێوچاوانەوە لە لایەن لادێیی و کۆچەرانەوە دەهێڵرێتەوە.

**بس:** بستی گیاندار. بلۆسکی ئاشی، بستی ئاشی.

**بسات** (ئەردە.): مایە، ساز، زەوینە.

**بساف** (باک.): چوست و چالاک. (باک.) ـــ ی: چوستی، چالاکی.

**بسام** (باک.): پەرێز، زەوییەکە دروێنەی لێکرابێ.

**بسە** (ئەردە.): بستە.

**بسەرخووە** (باک.): ئازاد، سەربەست. (باک.) ـــ ی: ئازادی، سەربەستی.

**بسەرڤەهاتی:** بەسەرهات.

**بسەرکەتن:** وەسەرکەوتن. ڕزگار و قوتاربوون.

**بسەرهاتی** (باک.): بەسەرهات، سەربردە.

**بسبسۆک** (باک.): چۆڵەچرا، شەوچرا، گوڵەنەستێرە.

**بسهۆر** (باد.): نۆکەر، بندەست.

**بست:** (زەن.) بنست، بنگس، بهۆست، (باک.) بۆست، بنگوست، (باک.) پانی دەستی کراوەوەیە لەسەری قامکە توو تەڵەوە تا سەری قامکە گەورەی. (باک.) شووشەی چکۆڵە. (باک.) شیشەی تفەنگی و کەبابی. بلۆسکی ئاش، (زا.) بستک.

**بستام** (باک.): مەرجان.

**بستان:** بوستان، بێستان، باغی گوڵ و گوڵزاران. لە بنچینەدا بۆستانە یا بێن ستانە وە یا بۆیستانە، جێگای بۆنی خۆش.

**بستە** (موک.): پارچە ئاسنێکە لەسەر تەندووری یا لەسەر ئاوورگێ دادەنرێت بۆ ئەوەی، کە دیزە و مەنجەڵی لەسەر دانرێ، بستۆکە، بیستیک. (خۆ.) ساقەت، لاسک و قونچک و ساقەتەترێیە. (کۆ.) پلە. ـــ لێدان: پلە لێ دان. (گەر.، کۆ.، هەو.) بلۆسک، (هەورا.) بندەق، میلێکی ئاشییە لەسەر تەوەرەی دادەنرێ بەرداشەکەی سەرەوەی

لەسەر دەسووڕێ. (باک.) فیزدار، بەفیز، بەهەوا. چتێکە وەک چەقالە سوێر دەکرێ و دەخورێ. چەقەنەی دەست. سەربەست: بارام ـــ چووە مالی ئاغا.

**بستەلێدان:** چەقەنەلێدان.

**بستەهی** (باک.): فیز، هەوا، لووت بلندی.

**بستک** (باک.): شیشەی تفەنگێیە. شیشەی گۆشت برژاندێ.

**بستوو:** بلۆسک، باسک، (هەورا.) بستی، ملە، کەل، کەلوو، کەل، هەوراز، کۆسپایی، گردو ملە و پارچە خاکێکی کەمێک بلندە.

**بستۆرە:** بەستوڕە.

**بستۆکە** (ڕەوا.): بستەی سەر تەندوورێیە.

**بستێ:** بڕوانە: چیای بستێ.

**بستی** (هەو.): بستوو، باسک، بستی، (هەورا.) ملە، هەوراز، گرد، ملە یا پارچە خاکێکی نەختێک بلندە. (باک.، بار.) کلۆش دووای دروێنەی بنی دەغلان. گۆشەدار، خاوەند قولینچک. ساقەتەی تریّ و هەموو میوەییێکییە. (خۆ.) شیشەی تفەنگێیە. (بار.) لک و کلکەی شاخانە.

**بسک:** قاو، لا، (فە.) ئەگریجە، زولف، (هەورا.) زلف، ئەو لزگە موانەیە، کە ئافرەتان بە لاجانگیانیدا شۆڕ دەکەنەوە، ئەگریجەی درێژە. (شو.) کولانەی مریشکان. (فە.) قولانج. (فە.) بالەخانە، کۆشک.

**بسکە:** کەیفخۆش، شادی، بز، ڕووگوشادی و زەردەخەنەیەکە لە ڕووی کەسێکیدا پەیدا دەبێ، کە سەر و دل خۆشبێ: فیسارەکەس ـــ ی لێوە دێ یا ـــ ی سمێلی دێ: بزەی سمێلی دێ.

**بسکەگیا:** قولەگیایەک، چەند چلێک.

**بسک بسک:** شادی، کەیفخۆشی، ڕووگوشادی.

**بسکۆ:** مافوورە، (باک.) بکۆ، ڕایەخێکە لە خوری باش دروستکرابێ.

**بسکۆک:** بسک.

**بسکۆکە:** بسکۆلە، پسکۆلە. لەرزانە. جوورە خشلێکی ژنانە.

**بسکۆلە:** بسکۆکە، لەرزانە.

**بسمار** (هەورا.): بزمار.

**بسمارە** (ئەردە.): مێخەکە.

**بسمارک** (فە.): بزماری پێ، مێخەکە.

**بسمبل** (باک.): بەرسمبێل.

**بسێلاک** (باک.): لیمدار، لێودار، (باک.) جێگایەکە خیز و لیمی ووردی زۆربێ.

**بسیلاک** (باک.): بسێلاک.

**بسێن:** کڕیار، کڕیدار. کەسێکە بەزۆر چتی لە مەردم بسێنێ.

**بسێنەوە:** هاودەنگ، کەسێکە وەلامی گۆرانی بێژ یا شیوەنکەران بداتەوە.

**بشافتن** (باک.): هەلپشاوتن.

**بشکافتن:** بشکاڤتن.

**بشکاڤتن** (باک.): هەلپچڕاندنی دروومان.

**بشکانن** (ئەردە.): پشکنین، گەڕان.

**بشکڤاندن** (باک.): پشکنین، لە تووەڕەهێنان.

**بشکڤین** (باک.): واق و وورمان، سەرسووڕمان.

**بشکور** (باد.): زەردە، زەردەخەنە.

**بشکووراندن** (باک.): کردنەوە بۆ یەکەمین جار.

**بشکوورین** (باک.): بچکڕین بۆ یەکەمین جار و کردنەوە.

**بشکۆژ** (باک.): دوگمە، (باک.) بشکوفت، (هەورا.) کانالێ.

**بشکووژ:** دوگمە.

**بشکووشک** (باد.): خونچەی گولّ.

**بشکۆفت** (باک.): دوگمە.

**بشکۆڤ** (باک.): دوگمە. خونچە.

**بشکوفت** (باک.): دوگمە.

**بشکۆل** (باک.): مژۆل.

**بشکوول** (باک.): قوڕ، قوڕاوی.

**بشۆ** (ژا.): بڕۆ.

**بشێڕبشێڕ:** لێکدالێکدا، پەیدەرپەی.

**بشێوە:** ناشوور و پشێوی.

**بشێوە‌نە** (ئەردە.): کەسێکە ناشووب بنێتەوە.

**بشێوی:** پشێوی.

**بعۆک** (زا.): مرۆی ناشیرین.

**بغە** (ئەردە.): گخە، بقە، گغ، زاراوەی منداڵانە.

**بغەبغ:** گخەگخ، گغەگغ، بقەبق.

**بفورد:** بخوور.

**بفوردان:** بخووردان.

**بفور:** بخوز: گاجووتێکە لەکاتی جووتکردنێدا مان بگرێت.

**بفورفرۆش:** بخوور فرۆش.

**بفرۆش** (ئەردە.): فرۆشیار.

**بق:** بقە، ووشەیەکە بۆ ترساندنی منداڵان بەکار دەبرێ تا دەست لە ئاوور و چتی پیس نەدەن. (ڕۆژ.) زەرگەتە. بقە، خەتەر.

**بقار** (باک.): بووار. خۆدیتن.

**بقاشتن** (باک.): (باک.) بقەشاندن، هەلوەشاندن، تواندنەوە.

**بقە:** بق، تەلەزگە، بۆ ترساندنی منداڵان بەکار دەبرێ تا دەست لە ئاوور و چتی پیس نەدەن. (بالە.) تەلەماسی، (بار.) بقۆک، (هەورا.) ماشە، (دەر.) لابڕ، چەپەر و تانۆکێکە ماسی لە ناویدا پێدەگرن.

**بقەبق:** بقەیەبقە بۆ منداڵان. (ڕۆژ.) لە ڕزین لەسەرمان یا لەبەر نەخۆشی.

**بقەشاندن** (باک.): لێک جووێ کردنەوە، تواندنەوە، هەلوەشاندن.

**بقەشین** (باک.): توانەوە، بلاو و جووێ بوونەوە، بقەشینە: بلاو و جووێ ببەوە، بتوێوە.

**بقر** (باک.، شکا.): بیوور، تەوور.

**بقۆک** (بارز.): ماشەی ماسی گرتنێیە. بقە.

**بقێ نەفێ** (باک.): بیەوێ و نەیەوێ، خواو نەخوا، دەبێ هەروابێ.

**بقێ نەفێنەیی**: ناچاری.

**بقە** (ڕۆژ.): پڵتە.

**بقەبق** (ڕۆژ.): پڵتەپڵت، پەڵتی زار، ددان بەوتە دانەنان.

**بقلیقۆک**: بلقی ناوێ.

**بقۆرسی** (باک.): هەڵگرتەنی، بکۆرس.

**بک** (موک.): کە جک لەکاتی جگێنێدا بەلا بەرینە قۆقزەکەیدا بکەوێ (بک)ی پێ دەڵێن. (باک.) دارێکە.

**بکەر**: پێکەر، بساز، چێکەر، چێکار. لە فرێزی ناویدا ئەو کەسەیە، کە بە کاری فرێزی کاری هەڵدەستێت.

**بکڕ** (باک.، هەورا.، موک.): کڕیار.

**بکلیقۆک** (باک.): بلقی ناوێ.

**بکۆ**: مافوورە، ڕایێخێکە لە خوری باش دروستکرابێ.

**بکوژ**: کووژەوە، خوونیی، خوونیی، کووژەر، کووژێنەر، کوژێن، کوژندە.

**بکوژوبەڕ**: بکوژوبوور، کوژندە و برندە.

**بکورسی** (باک.): هەڵگرتەنی، شایانی خۆگری و دڵهەڵگرتن.

**بکێڵ** (ئەردە.): جووتیار، وەرزیار، جفتیار.

**بکێڵگە** (ئەردە.): کێڵگە، زەوی کێڵراو.

**بگار** (جا.): ڕەووز، ڕیواز، گوزەرگا، بووار، شوورێنێکە لە ئاودا، کە تەنک بێ و بتوانی لێی بپەڕیەوە. ـــ م نادا: بووارم نادات.

**بگارە** (ئەردە.): بووارە، تێپەڕین، پێدڕێژی.

**بگارەدان**: بوواردان.

**بگاردن**: تێ پەڕاندن، ئەنجامدان، پێکهێنان، تەواوکردن. هەپرووکردن. بگیرانن، نواندنی شاهد و ئیتر. وازلێهێنان، بەجێ هێشتن، فەرامۆش کردن.

**بگەڕ**: گەڕیدە، گەڕهوێر.

**بگەووە** (باک.): بەهێز، بەتین.

**بگر**: گیرندە، ئەو کەسەیە گیان لەبەر یا چتێکی بگرێ.

**بگرای بگر**: بگرەبگرە و بگرە و بی بەستە.

**بگرە**: وەبزانە، وابزانە، واداتێ: ـــ چەند ساڵە تۆم نەدیتووە.

**بگرەوبەردە**: هەراهەرا، ئاشووب و پشێوی، پێکدادانی مرۆڤ: ئەوەی بگرە و هۆوەی بەردە.

**بگرەوبکێشە**: هەراهەرا، کێشەکێش.

**بگرەوبگر**: بگرەوبگرە.

**بگرەوبووەسە**: بگرەوبیبەستە.

**بگردگ** (ئەردە.): ڕابردوو، پێویست.

**بگردن** (ئەردە.): ڕابووردن، ڕەتبوون، تێپەڕین. بەخشین، لێ بووردن.

**بگێڕ**: شاگردێکە لەلای کارگەچیان لەباد و چتی تر دەپەستێتەوە و دەیگێڕێ.

**بگیران**: بگارد، بەجێی هێشت، لەبیری کرد.

**بگێڕانن**: بگاردن، تێپەڕاندن، ڕابووردن.

**بل** (باک.): جگە، بێجگە، بێ لە، بلی وی: بێجگە لەوی، بێ لەوی. (شەبە.) ڕزیشتن.

**بڵ**: لە بڵباس قوڵەکراوەتەوە بۆ سەرچاوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە. گەیشتوو و نەرم و بڵ، میوەیێکە یا تەرەکارێکە تێوەکەی نەرم و شل و ڕزیو بێ، تەپیو. ـــ بوون: نەرمبوونی چت لە ئەندازەی خۆی، گەیشتن و تەپینی میوە پتر لە ڕادەی خۆی.

**بلا** (باک.): با، بلاّ، دەبا، بۆ بەهێز کردن و جەختە. ـــ بڕوا: با بڕوا.

**بلاّ**: بەلاّ، بلاّنە، سا، دە، دا، دەبا، با، دەجا، بلا، لێی گەڕێ.

**بلاتە**: بالەتە.

**بلاچە** (ساڵە.): برووسک.

**بلاڤ** (باک.): بلاّو. ـــ کرن: بلاّوکردن.

**بلاّلە** (باڵە.): پەسیرەی هەنجیری.

**بلاّلووک**: ئاڵووباڵوو.

**بلاّلووکەکێفیلە**: ئاڵووباڵووی کێوی.

**بلام**: بەلاّن، بەلاّم.

**بلاّم**: بەلاّم، بەلاّن.

**بلامک**: بزمۆک.

**بلامکەر** (باک.): زۆرخۆر. (باک.) ـــ ی: زۆرخۆری.

**بلاّن**: بەلاّم.

**بلانە**: بلاّ، با، سا.

**بلاّو**: پەرت، پەرش، چرژ، پەرێشان، پژباگ، (باک.) بلاڤ، بەلاڤ، بلا، بەلا، پەخش، چرقر، پرژ، پرش، (هەورا.) وولاّو، وەلاّو. (باک.) بەردبار. گوشاد، بەروەدەر. ئاشکرا. ـــ بوون: چرژان، تەنینەوە، پژان. ـــ بوونەوە: بلاّوەبوون، (هەورا.) وەلاّبیەوە، پژان، پرژان، پرژیان، لێک دوورکەوتنەوە. ـــ کردن: پشاندن، چرقراندن، چرپاندن، چرژاندن، بەخشەوکردن، بلاّوەوکردن، پرژاندن، پرشانن، پژانن. ـــ کردنەوە: پەخشکردنەوە، پژاندن. ـــ کەرەوە: پەخشەر.

**بلاو**: (ئەردە.) ئاڵقەی ناولغاوە، کە دەچێتە ناو زاری وولاّخەوە. بوویژ، مووشگەر، ئەوکەسەیە بە مردووان هەڵدەڵێ.

**بلاّوە**: بلاّوبوونەوە، پەراگەندەیی. ـــ کردن: (هەورا.) وولاّوەکەردەی. ـــ پێ کردن: پەرت و بلاّوکردنەوە.

**بلاّوەپێکردن**: بڕوانە: بلاّوە.

**بلاّوەکردن**: بلاّوبوونەوە، وولاّوە.

**بلاّوەلێکردن**: پەرت بوون، بلاّوبوونەوە.

**بلاّوبوون**: بڕوانە: بلاّو.

**بلاّوبوونەوە**: بڕوانە: بلاّو.

**بلاّوکران**: پەخشان.

**بلاّوکردن**: بڕوانە: بلاّو.

**بلاّوی**: پەرتی.

**بله** (موک.): بڵێ.

**بڵه:** زماندرێژی.

**بڵەبڵ:** زماندرێژی.

**بڵەخش:** گەوهەر.

**بڵەربەزین:** بلوێربەزێن.

**بڵەزەندەر (کە.):** چەتەوول، ناقۆڵا، لەندەهۆر.

**بڵەکناچێ:** ژنانیلە، پیاوی ژنانی.

**بڵەگاز:** هەژار، بەلەنگاز، بەدبەخت.

**بڵەماچ:** پەڵووی شلە.

**بڵەمرک (خا.):** بەلەمرک، ئانیشک.

**بڵەنگاز:** هەژار، بەلەنگاز، بەدبەخت، دەربەدەر.

**بڵەوحەز (موک.):** ناقۆڵا، نالەبار، لەندەهۆر. تەمبەڵ.

**بڵەوور:** شووشەی چرا، بڵلوور.

**بڵباس:** خێڵێکی گەورەی کوردە و پێنج تیرەیە: ١) وەجاجی کاخدری. ٢) ئاکۆ. ٣) مەنگوڕ. ٤) پیران. ٥) مامەش. ـــ ی: شێوەی بڵباسان. جوورە دروومانێکە.

**بلبال (باک.):** گژ وگیای خواردنێیە.

**بلبزیق (باک.):** جوورە گیایەکە.

**بلزێک (باک.):** جوورە گیایەکە.

**بلبزیک:** جوورە گوڵێکە ڕەنگە مژمژەبێ.

**بلبزێکی (باک.):** جوورەگیایەکە.

بلبل

**بلبسین (باک.):** واق و مات و وڕبوون، سەرگەردان بوون.

**بلبل:** بولبول، باڵندەیێکی دەنگخۆشی بازەڵەیە هێندەی چۆلەکەیەکییە.

**بلبلە:** چەنباز، زۆربڵێ. خشڵێکە زنجیرێکی زێڕی دوو پەتی تێدەخرێ و گۆی بە پڕپەی بە نێوانیاندا دێتەخوارێ، بولبولە.

**بلبلیک (باک.):** نووکی قابان.

**بڵتە:** دەنگێکی گچکەیە، کە بریتییە لەکەوتنی چتێکی ڕەق بۆ ناو چتێکی شل بە چەشنێکیدا ئەودەنگە پەیدادەبێ، کە لە قوڵتە گچکەترە.

**بڵتەبڵت:** بڵتەی یەک لە دووای یەک.

**بڵچ:** گێووژ، گۆێژ.

**بڵچەزەردە:** گێووژی کێوی، کە سێ دەنکی هەیە.

**بڵچەسوورە:** گێووژە سوورە.

**بڵچی (هەورا.):** گێووژ، گۆێژ.

**بڵح:** ناڕاست، سووک، تەنبەڵ، بێ هونەر، تەپ، گێل، گێژ، چتی بێ کەڵک. حیز، هەرزە، سووک بۆ نێر ومێ.

**بڵحات (ڕەوا.):** فێڵ، فریو، بلعات.

**بڵخ:** تلّپە، توویژێکە بەبەردی ناو ئاو و یان بە قەراغ حەوزانەوە دەبینرێ.

**بڵخاخ (ڕۆژ.):** هەرا و قیرەقیڕ، هەراوهووریا.

**بلسک (فە.):** قولانج.

**بڵسک:** بڵووسک.

**بڵسکک:** بس، بست.

**بلفڕە:** باڵندەیێکی بچووکی کەوەڵەیە لەکاتی فڕینێدا باڵی فش ناکات.

**بڵق:** کەفی سەرئاوێ، گومزە، (ئەردە.) گومەزە، بڵقی سەرئاوی، بڵقی ئاوێ، قڵپ، (هەو.) بۆقژە، (ڕەوا.) پۆقژە، بەقبەقۆک، (باک.) پەقپەقۆک، پەقیژۆک، بقلیقۆک، (باک.) بکلیقۆک. بلۆق. بۆشاییێکە لەناو شلەمەنیاندا پەیدا دەبێ بەهۆی ئەوەوە، کە بای تێچووبێ.

**بڵقاندن:** بڵقدان، (باک.) بەلقاندن.

**بڵقاو (ئەردە.):** زەلکاو، گومزە، شوێنێکە بڵقی ئاوی زۆر بێ.

**بڵقە:** دەنگێکە لەکاتێکیدا پەیدا دەبێ، کە هەوا لە ژێر ئاودا بێتە دەرەوە.

**بڵقەبڵق:** بۆقەبۆق، دەنگی ئاوێکییە، کە چتێکی تێ ئاوێژرێ و لە ئەنجامدا بڵقی لەسەر ڕادەوەستێ.

**بڵقەدەرە:** (موک.) هەڵپەزە، (بڵ.) دوورقەدەرە، شەوگەرد، داعبایەکە وەکوو مارمێلکەی وایە، بەڵام کەمێک فش و ئەستوورترە دەڵێی ئاوسە، کە چتێکی وێکەوێ زۆر ئاسکە لە خۆڕا دەتوڵێختێتەوە، هێندێک کەس دەڵێن بە خەڵکی دادەمیزێ و هێندێکیش دەڵێن بەزاری ئاوێکی داوێ وە هەرکەسێکی بکەوێ دایدەڕزێنێ.

**بڵقدان:** سەر هەڵدانی بڵق لە شلەمەنیاندا.

**بڵق هەڵدان:** بڵقدان.

**بڵق و هۆڕ:** بڵقەبڵقی زۆر.

**بلکێف:** سەیرانگایەکی خۆش و ڕەنگینە لە هەرێمی مزووریدا.

**بڵماندن:** بڵمەبڵم کردن.

**بڵمە (ڕۆژ.):** بۆڵە، دەنگی وورچ و چتی وایە، دەنگدانەوەی تۆپییە، پرمە.

**بڵمەبڵم (ڕۆژ.):** بۆڵەبۆڵی پیرێژنان و پیرەمێردانی بێ ددانە، یا هی کەسێکی لەسەرەمەرگدابێ، پرمەپرم. دەنگدانەوەی تۆپ. ـــ ی بەرازی: مرقەمرق، فیکەفیک.

**بڵمەتانە:** مرقەمرقانە، نیکەنیکانە.

**بڵمەتکار:** ئەو کەسەیە، کە بڵمەبڵم دەکات.

**بڵن (ئەردە.):** بڵند.

**بڵنایی (ئەردە.):** بڵندایی.

**بڵنەوبوون:** بەرزبوونەوە. پەتربوون، سەرکەوتنی بەژنی مرۆ و دار وشینایییان.

**بڵنەوکردن:** بەرزکردنەوە.

**بڵند:** بەرز، حەوا، قیت، بوند، (باڵە.) سەلیل، بانی، بەرووەژوور، هەوراز، بانی بەرز، قووت، قیت، (باک.) ئەراوەند، (باک.) ئەڤرا، ئەڤراز، ڕاسەرین، ژۆر، ژووروو، (باڵە.) بێند، ژۆروو، قووچ، لە ـــ ان هاتنەخوار: سەرەوژێربوون، کەمکردن. ـــ فڕین: وەحەواکەوتن. ـــ بوون: بەرزبوون، ڤەگژگژین، بهەواکەتن. ـــ کردن: ڤەناندن، (باک.) ڤەگژگژاندن، ئەڤراکرن، (باک.) هلکافتن، هەڵێنان، هەڵهێنان.

**بڵنداهی:** بڵندایی.

**بڵندیی:** بڵنداهی.

**بڵندبوون:** بەرزبوون، ڤەگژگژین، بهەواکەتن.

**بڵندبوونەوە:** بەرزبوونەوە.

**بڵندجە** (باک.): گەورە، پایەبەرز. (باک.) ـــ یی: گەورەیی، پایەبەرزی.

**بڵندکرنەوە:** بەرزکردنەوە، ڤەنانندن، ڤەگژگژاندن، ئەڤراکرن، هەڵێنان، هەڵهێنان، هلگافتن.

**بڵندی:** بەرزی، گڤاند، هەندەڤ، حەوایی، بڵندایی، بڵنایی.

**بڵندین** (باک.): ئاستانە، بەردەرگانە.

**بڵندینە** (باک.): ئەوپەڕی پایە.

**بڵنی:** بڵندی، بڵندایی.

**بلۆ** (باک.): جاڵجاڵۆکە، داپیرۆچکە. (هەورا.) برۆ، هەرە، بچە.

بلۆ

**بلۆر:** مینا، بەلوور، بللوور.

**بڵۆچە** (جا.): کۆجیلەیەکە ئەیاری ئاشییە مزاشی پێ وەردەگیرێ.

**بلوور** (دەر.): بلوێری شایی و بەزم. بلوێری لانکی منداڵان. بلۆر، مینا، (باک.) بەلوور، بللوور، شووشە، ئاوێنە.

**بلوورڤان:** بلوێر لێدەر، بلوێرژەن.

**بلۆرڤان:** بڕوانە: بلوورڤان. ـ ی: بلوورڤانی.

**بلووری:** کلۆیی. هوومایین، مەڕمەڕشا، جوورە چنراوێکی سپی تەنکە دەکرێتە کراس و دەڕپێ.

**بلۆسک** (هەورا.): ئەو میلە ئاسنەیە، کە سەرێکی لەسەر تەوەرەی ئاش دادەنرێ. واتا لە هەردوو بەرداش هەڵدەکێشرێ سەری سەرەوەی لە تەوەرە دەخرێ تا بەرداشی سەرەوە بسووڕێنێتەوە ئەویتری لە تۆپەکە قایم دەکری تا تۆپەکە ئەوی بسووڕێنێتەوە. شیشەی کەبابی. (شار.) لووتکەی چیا، (کۆ.) سکەپک.

**بڵووسک:** بستەی سەرتەندوورێیە. (هەورا.، کە.) بستەی ئاشی.

**بلۆق:** تلۆق، دلۆق، کیس، (شار.) ئاولک، پۆرگ، (ڕۆژ.، دەر.) پۆقلە، پفکە، بڵق، بلورق، شووێنێکە لە هەموو لەشدا بە تایبەتی لەدەست و پێدا، کە ئاوی گەرمی بەسەردا ڕژابێ و یان سووتا بێ و یان بەهۆی ڕۆیشتن و پێڵاوی تەنگەوە کوترابێ بلۆق و پفکەی دەکات و پڕ ئاو دەبێ.

**بلووق:** پێکەیین، ژنکامی، شووکامی.

**بلۆقدار:** پفکەدار. ـ ی: پفکەداری.

**بلووک:** ناوچەیێکی گەورەیە، کە چەند ئاواییێکی تێدابێت.

**بڵووک:** مێگەل، بەرە بەرخ و یا بزن و مەڕ و کار.

**بلوول** (باک.): نووک و دمکی قابانە، (باد.، کۆ.، دزە.، خۆ.) بلوێری زەماوەندێ. ـ ی لانکی منداڵان.

**بلوولک** (باد.): بلوێری لانکێ.

بلوێر

**بلوێر:** بلوور، نای، نەی، (هەورا.) لوولێ، بلۆر، (باک.) بلوور. ـ لێدان: نەی ژەنین. ـ لێدەر: نەی ژەن.

**بلوێربەزێن:** چەنەباز، زماندرێژ. ئازا، تووشمال، دیواندڕ، زاتدار.

**بلوێرپێچ:** پارچە پەڕۆیەکە دە بلوێری منداڵان دەپێچرێ تا منداڵەکە بریندار نەبێ.

**بلوێرپێچک:** بلوێرپێچ.

**بلوێرژەن:** بلوێرلێدەر.

**بلوێرلێدان:** نەی ژەنین، فوو لە بلوێر کردن و دەنگ لێهێنانی.

**بلوێرلێدەر:** بلوورڤان، نای ژەن.

**بلهەوەس:** خاوەندهەوەس، هەوەسدار.

**بلی:** بێجگە، جگە، بێ لە، بژی. (شەبە.، ڕۆژ.) دەچم، بەسەفەردەچم، تەنها بۆ سەفەردەبێ.

**بڵێ:** (هەورا.) واچە، (هەمە.، دەر.) بوش، بۆش، (کژ.) بووژە، (باک.) بووێژە، ببێ، بێژە، (هەمە.) بووشە، (زەن.، شەبە.) باچە، بێش.

**بلێ:** دێیەکی بچووکە لە بادیناندا و ناوچەی میرییە.

**بلیت:** پارچە نووسراوێکە دەدرێ بەکەسێکی، کە بەهۆی ویەوە دەتوانی بچێتە ناو سینەما و شووێنانی تر بەپارە. بارنامە، تێپەڕنامە.

**بلیتچی** (باک.): وەرگر.

**بلێچ** (باک.): برووسکە، شمشە.

**بڵێزە:** بڵێسەی ئاووری.

**بڵێسە:** مەلاشە، هێڵە، کڵپە، گڕ، گرێن، زمانە، زووانە. ـ دان: کزراندن، کڵپەکردنی ئاوور.

**بڵێسەبڵێس:** هێڵەهێڵ، کڵپەکڵپ، سووڵەسووڵ، نێڵەنێڵ، بڵێسەی یەک لەدوای یەکتری.

**بڵێسەدار:** گڕدار.

**بڵێسکە:** فیچقەی خووێن، بە ڕێژنە هاتنەخووارەوەی شیریش دەڵێن.

**بڵێک** (باک.): کرێوە.

**بڵێمانە:** گریانە، لیمانە، بریوان، خووێن و خوڕێکە دووای زانێ بە ئافرەت و هی تردا دێتە خووارەوە. کێم و هەوای زەحیری دارانیشە.

**بلیمەت:** بەهووردە، زۆرزان، کەمۆ، بەرگەر، پیتۆر، زۆر ووریا، زۆر زیرەک، دووهووردە، هەڵکەوتوو، لێهاتوو. پڕسام، سامدار، هەیبەتدار.

**بلیمەتانە:** زۆرزانانە، زۆرزیرەکانە.

**بلیمەتکار:** بە هووردەکار. ـ ی: بە هووردەکاری.

**بلیمەتی:** بە هووردەیی، زۆرزانی، کەمۆیی.

**بڵێن:** ئێوەبێژن، ئەوان بێژن، کاری فەرمانە بۆ کەسی دووەم وسێیەم لە باری کۆدا. کە بۆ پرسیار بەکار ببرێ لە جیاتی ئایا بڵێن، کە ووشەی ئایا فڕێ درێ لە گۆکردنی (بڵێن) دا دەنگ وەکوو دەنگی پرسیاران بەکار دەبرێ.

**بڵێنەبێژ:** بڵند بێژ، میکرۆفۆن.

**بڵێی:** (خۆ.) بەرێ شاڵلا. تۆ ـ وابێ: دەڵێی ڕاست بێ، ئایا تۆ لات وایە، کە ئەم کارە وایە؟.

**بڵێین:** ئێمە بێژین، بووێژین. کە بۆ پرسیار بەکاربرێ دەنگی لەکوتندا دەگۆڕێ.

**بم:** قەڵەوی خڕین. ـ کردن: خۆگێڤ کردن، بمگرە: ئەمن بگرە بە پێچەوانەی مەم.

**بمرە:** گیان بدە.

**بمزانیایە:** بزانیبایە.

**بمسێنەرەوە:** بمکرەوە، بم نەستێنەوە، رزگارم کە.

**بمکردن:** خۆگێف کردن.

**بمێنە:** لێرە بەجێ بمێنە، پایەدار بە، بژی.

**بن:** ژێر، بنەوە، چێر، ناخ، پایان، بناغە، کۆتایی، بێخ. راناوی کۆی دووەم و سێیەمینە بە دووای ووشانەوە دەنووسێ وەکوو: کرابن، خورابن، هاتبن، دانیشتبن، راوەستابن. کچێنی، خامی، کەنیشکی.

**بناتی:** بنیات، بنیان.

**بناچە** (باک.): بنەچەکە.

**بناخە:** بناغە، بنکە، پایە، بنچینە، دەهکەر.

**بنار** (موک.): ـــ ی کێوی: داوێنی خووارەوەی کێوی، (بار.) پنار، (ئەردە.) بنەوە، داینە، (خۆ.) پێداگرتن، لەسەرچوون، لەسەر رۆیشتن، رەک، رک، (کۆ.) رکە، (دزە.) شەر، کێش، رکەرک، (دەر.) شەرووبنار، هەڤرک.

**بنارە:** گرووگرتنی مندالان، هەڤرک، وورک، (رەوا.) درنەگە.

**بناغە:** بناخە، بنکە، پایە، بنچینە، دەهکەر، خیم، (باک.) بنەستر، تەمەل، شەنگستە، قانگە، بنک، بنەقار، نەغمە، گەوەر، هیم، بنەرەت. چەند چینێکیشە لە دیوار لەناو بناغە لەسەر زەوی ساخ دادەنرێ. ـــ ی شەری: بنکەی شەرێ.

**بناغەدانان:** دانانی بناخە لەسەر زەوی ساخ.

**بناغەدانەوە:** هەڵکەندنی بناخە.

**بناغەنان:** بناخەدانان.

**بناغەنانەوە:** بناخەدانەوە.

**بناغەهەڵکەندن:** هەڵکەندنی بناغە.

**بناغەهەڵبەستن:** هەڵبەستنی بناغە.

**بناڤ** (باک.): بەناو، بەناوبانگ.

**بناڤێ** (باک.): شەر، زۆرەوانی.

**بناقا** (ئەردە.): بیناقاقە.

**بناقاقە** (ئەردە.): بیناقاقە، گەروو، ئەووک، رەگ و دەمارەکانی گەروو.

**بناگر** (بن ئاگر): دەستەچیلە.

**بناگرە:** هەوێرێکە لەبن ئاوری دادەنرێ تا ببرژێ.

**بناگری:** بناگرە.

**بناگۆش** (هەورا.): بنانگووێ.

**بن نامۆزا:** (هەورا.) مامۆزازا.

**بنانگووێ:** (خۆ.) بەرگێ، (هەورا.) بناگۆش، (باک.) بنگەمە، بنگووێ، بنگووێچکە.

**بناگووێچکە:** بنانگووێ.

**بنانی** (باک.): قووڵی، بنیان، بنەرەت.

**بناو:** داری بناوەچ، دارێکە هێندەی دارەگوێزێکی بڵند دەبێ ولق و پۆپی بڵاوە و لەبەر قورسی لە ئاوێدا نوقوم دەبێ، گۆچانی لێ دروست دەکرێ، (کۆ.) بینە، بە بن ئاودا رۆیشتن.

**بناوان** (موک.): کابانی ماڵێ، بنەوانە، ئافرەتێکە ماڵی رەنێو بێنێ، (هەورا.، رەوا.) بەند، سەرچاوەی ئاوێ، بەرهەڵستێکە لە پێش ئاو تا بەرز بێتەوە، (باک.) پرۆزە. بنەچەکە، بن و بناوان.

**بناوان هەڵبەستن:** بەرهەڵست لەبەردەمی ئاودانان بۆ بەرزکردنەوەی ئاو تا بتوانرێ شووێنی بڵندتری پێ ئاو بدرێ.

**بناوانک** (باز.، گەرد.): مشکە کوێرەیە گڵی بە کۆمەڵ لە دەشتێ دەردەخاتە سەر زەوی.

**بناوەتۆم:** رووەکێکی ناسراوە.

**بناوەچ:** دارێکی زۆر بەرزنیە گەڵای وەکوو گەڵای سپیدارە، دەکوڵێنرێ و گەڵا کوڵاوەکەی لە شووێنی ماران گەستە دەنرێت، کە وەکوو دۆشاو خەست بکوڵێنرێ بۆ برینی ئاژاڵ و ووڵاخ و ماڵاتان زۆر باشە.

**بناوورگ:** بن ئاگردان، (کە.) بن کووانوو.

**بناوێ:** بناو.

**بناویلە** (دزە.): باڵندەییێکی رەشە لە رەشۆڵەی گچکەترە لەکەنار ئاوان دەژی.

**بنە:** سووکە ماڵێکە، کە ببرێ بۆسەر رەز یا هەوراران. بنەگە، قۆناخ، بارگە. بنگە، دەستوور، رێزمان، بنکە. مەکۆیەکە لە پووش و پەلاش راوکەر خۆی تێدا حاشاردەدا بۆ راوی کەو و باڵندە و گیانەوەران. سۆراخ، بەشووێن و بنچینەدا گەران. (فە.) داری بەری. گیایەکە لە گێرەدا لە پەری ئاوەوە دەبەسترێ.

**بنەبان:** لای سەروو، لای ژووروو، پشتەوە. ـــ ی خانوو: نژارە.

**بنەبەنگە** (ئەردە.): بەستی بەردەمی ئاو، بەند.

**بنەبڕ:** چتێکە دووایی هاتبێ و کۆتایی هاتبێ، بنبڕ، بێخ بڕ، ریشەبڕ. ـــ بوو: کۆتایی هات.

**بنەبڕبوون:** لە ریشەهەڵکەنران، برانەوەی چتێک.

**بنەبڕکردن:** لە رەگ و ریشە دەرهێنان، براندنەوەی چتێک.

**بنەبنە:** لای هەرە خووارەوەی کێوان.

**بنەبیت:** دەستمایە، سەرکۆزەری بنخەرمان لە پاشان کۆدەکرێتەوە، بنخەرمان.

**بنەتار:** بناغە، بنیات، بنیاد.

**بنەتان:** دارەکەی خووارەوەی کەرەستەی تەونییە، کە لەنێو کونی سمتەکی دەنرێ و تەونی پێ قایم دەکرێ.

**بنەتۆ:** بنتۆوی جووتی، بنەتۆم.

**بنەتۆم** (ئەردە.): بنەتۆو. ریشە، رەگ، رەتەوە.

**بنەتۆمە:** بنەتۆو.

**بنەتۆو:** دانەوێڵەییێکە، کە فەلەخووێ بۆ چاندنی ساڵی تازەی هەڵدەگرێ و یا چاند بێتی. مایە.

**بنەجوو:** بنجوو، فەرخەجوو، رەچەڵەک جوولەکە.

**بنەجووت:** شووانکارە، جووت و گاو تۆودانە، کە دەدرێ بە جووتیار بە نیوەیی.

**بنەچە** (هەورا.): بنەچەکە، رەگەز.

**بنەچەکە:** ڕیچەڵۆک، ڕەچەڵەک، بنیات، بنەڕەت، جیل، بناچە، (باک.) بناوان، (هەورا.) بنەچە، ڕەگەز.

**بنەچڵ:** بنچین.

**بنەخڵ** (ئەردە.): بنباخەڵ، بنباغەڵ، بنهەنگڵ. خشت، خشتک، گردەڵە، کەرپووچ، لگین.

**بنەدار:** بەدەنی دار، لەشی دار. (باک.) جێ نشین،نوورێنەر.

**بنەدەمە:** جۆرە دروومانێکە.

**بنەڕان:** شوێنێکە تایبەتییە بۆ مەڕان، مۆڵگە.

**بنەڕەت:** بنچینە، بنگەهە، بنی بنی، بنی بناغە، بنی ڕەگ و ڕیشە، (هەورا.) بناخە، بنەوا، شوێنەوار. ـــ ی: بنگەهی.

**بنەرد:** سێوی بن عەردی. ـــ ی: ژێرزەوی، بن عەردی.

**بنەرۆک** (ڕەوا.): پاشماوەی دەغڵ و دان و خوری و هەر چتێکی بێت، (دەر.) بنۆک.

**بنەزمان** (باک.): گرێ و یا قوونێرێکە لە بنی زمانی وولاخان پەیدا دەبێ.

**بنەفەلە:** بندیان.

**بنەفش:** وەنەوشە. ـــ ی: بنەوشی، وەنەوشەیی. جۆرە بووزوویێکە.

**بنەقاقە:** بینەقاقە.

**بنەکەش:** بنکەش.

**بنەکدار:** بازرگان، بندار. ـــ ی: بازرگانی، بنداری.

**بنەکردن:** ئانەوەی چت لە لایەن دز یا دەستکێشەوە لە پێش دزینیدا بۆ ئەوەی، کە دەرفەتی دەستکەوت بیدزێ. دزینەوەی ئەو جێگایەیە، کە چتی دزیاری تێدا حاشاردراوە، سۆراخکردن.

**بنەگا** (ئەردە.): هەوارگە، بنەگە.

**بنەگە:** قۆناخ، چەقز، میوانخانە. بنە، دەستوور. بنگە، لەکاتی بانەمەڕێدا، کە پاوان و یا شوێنی لەوەڕ دیاری کرا سووکە ماڵێکی دەنێرنە ئەوێ.

**بنەگرتن:** دامەزران، جێ گرتن.

**بنەگرتوو:** دامەزراو.

**بنەگڵ:** بنهەنگڵ. بنەخڵ.

**بنەگۆزەڵە:** گیایەکە وە برکەی شوتی دەچێ بنەکەی دەخورێ، (خۆ.) سەرکەشکۆرە.

**بنەگۆزروان:** بنی گیای گۆزروانە.

**بنەلی** (باک.): نهۆمی خوارەوە، نهۆمی ژێرەوە.

**بنەماڵ:** خانەدان، خانەوادە، بنەماڵە.

**بنەماڵە:** خانەدان، (کە.) بنکوانوو، خانەوادە، گەورەماڵ، (باک.) مالبات.

**بنەمێو:** دارەمێو، داری ترێ.

**بنەوا** (ئەردە.): بناوان، بنەبنگە.

**بنەوان:** بنەوانە، بناوان، کابانی ماڵێ، ماڵ ڕەنێوەهێنەر.

**بنەوانە:** بنەوان، ئافرەتێکە ماڵێ ڕەنێوبێنێ، کابان.

**بنەوە:** ژێرەوە،لای خوارەوە.

**بنەوەند** (موک.): قایشێکە سەری نیری لەگەڵ ئامووری دەبەستێتەوە.

**بنەوش:** وەنەوشە و ڕەنگی بنەوشەیی.

**بنەوشە:** پارچەیێکی شینی ئاوریشمییە ژنان دەیکەنە بەرگ، وەنەوشە، (باک.) بنەفش، گوڵە ـــ : گوڵی وەنەوشە.

**بنەوشەیی:** وەنەوشەیی.

**بنەوشۆکە:** قەزوانی وورد، (هەورا.) مشک.

**بنەوشی:** (باک.) بنەفشی، وەنەوشەیی، چتێکە ڕەنگی وەکوو ڕەنگی بنەوشەی وابێ.

**بنەوشیلە:** بەری داری وەنەتەقە.

**بنباخەڵ:** بنهەنگڵ.

**بنبادە:** ناڵبەکی.

**بنبار:** بارێکی گچکە و سووکە لە ژێربارى لە وولاخ دەکرێ. پێزان، مەنەتبار. ـــ ی: پێزانی، مەنەتباری.

**بنباقۆزە** (ڕەوا.): گیایەکە بنەکەی دەخورێ.

**بنباڵ** (فە.): بنهەنگڵ.

**بنبەخەڵ:** بڕوانە: بنباخەڵ.

**بنبەرد** (خۆ.): گیایەکە لەناو بەردیدا شین دەبێ پەلکی پانە و نیوگەزیش بڵند دەبێ و دەخورێ و شیرینیشە.

**بنبەردەقیبێ:** گیایەکی کوێستانی خۆشە وە ڕێواسی دەچێ.

**بن بەردووگ:** گیایەکی یەکچڵی بەهاری و کوێستانییە لاسکەکەی وەهێرۆ دەچێ، چەند گوڵێکی ووردی سپی دەگرێ.

**بن بەردووکە** (ڕەوا.): ڕێواسێکە لە نێو دوو بەرداندا دەردێ زۆر ئەستوور و ناسک و خۆشە.

**بنبڕ:** بنەبڕ، ڕیشەدەرهێنەر. ـــ بوون: لە ڕیشەهەڵکەنران. ـــ کردن: لە ڕیشەهەڵکەندن.

**بنبزوو:** بن کلکی وولاخ.

**بن بێژنگ** (موک.): ئەو دەنکەگەنم و دەخڵ و دانەیە، کە دووای کوتان و لە بێژنگدانی بە خۆڵەوە لە بنیدا دەمێنێتەوە، وە یا ووردەیەکە لە بێژنگ دەکەوێتە خوارێ.

**بن پاڵ:** تەنیشت، تەک، پەنا، کەلێن. بنهەنگڵ، بنکەش، بندەس، بنگڵ، ژێرباڵ.

**بن پەرگ** (شار.): دووای لێکدانی سەرو بنی کەلاش بە یەکەمین چنینی پێی دەڵێن:ـــ.

**بن پەل** (ڕۆژ.): ئەو گەڵا توتنانەیە، کە پەسند ناکرێن و سەر چڵ نین، یەکێکە لە دوو جۆرەکانی تووتن.

**بنپەلک:** سوورەپەڵ (بۆ تووتن بەکاردەبرێ).

**بنپژان:** بنڕژانی کچان بەهۆی کەوتنەخووارەوەی لە جێگای بڵندەوە.

**بنپژاندن:** بڕوانە: بنپژانن.

**بنپژانن:** کەنیشکی هەڵگرتن، کچێنی لابردن.

**بنهشک:** کچێکی گچکەیە، کە بەهی گەورە ناڵ و گۆڕ بکرێ پارەی لەگەڵ بێ یا نا.

**بنهیاڵە:** ناڵبەکی، ژێرپیاڵە.

**بنتاقی** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**بنتاو** (ئەردە.): لکە تازەکانی دارە، کە تازە دەڕوێ، بندار، نەمام، بنی دار، قەدی دار.

**بنتەک** (ئەردە.): بنپاڵ، کەلێن، تەنیشت، لا.

**بنتل** (ئەردە.): یەکەمین گوێزێکە، کە منداڵان لە گەمەی گوێزێنیدا دایدەکەن و تیلی تێ دەگرن. بەرد یا لیسێکە، کە بخرێتە ژێر تاوێرێکی گەورە تا بە ئاسانی تل بدرێ.

**بنتلە:** یەکەمین گوێزێکە لە گوێزێنیدا، بنتەل.

**بنتیان:** هەڵوا و گەزۆیەکە، کە بە بنی تیانەوە دەنووسێ.

**بنتیک:** پێکەوەنانی پارچەی کاڵا بەدروومان لە پێش هەڵپێچانیدا.

**بنج:** بنچینە، بلگەم. ڕەگ، ڕیشەی داروودرەخت، لق و پۆپی گوڵ و گیا.

**بنجامە**(باک.): ساختەچی، فێڵباز.

**بنجامەتی** (باک.): ساختە، فروفێڵ.

**بنجەخاڵ:** بروانە: بنباڵ.

**بنج:** ڕەگ و ڕیشە، بێخ. ـــ کردن: پاڵشت دان، جەختکردن، جێ بەجێ کردن و دامەزراندن.

**بنج بەست:** بناغە پتەوکردن، ڕووەکێکە، کە ڕووابێ و ڕەگی داکوتابێ.

**بنج داکوتان:** ڕیشەداکوتانی درەخت و سەوزایی، جێ گیربوونی چتێک.

**بنجک:** پنچک.

**بنجوو:** بنەجوو، کەسێکە باب و باپیری جوولەکە بووبن. کلێنچکە.

**بنج و بناوان:** سەرچاوە و بناغەی کارێک.

**بنجووچکە:** کلێنچکە.

**بنجۆری:** بەدووی چتێکیدا گەڕان، پەیداکردن.

**بنجووری:** بنجۆری.

**بنجۆگە:** بنجۆ.

**بنجی:** بنگەهی، بنیادینی، (باک.) بەرێا، بنچینە

**بنچاخ:** قەواڵە، سەنەدی سامان و دارایی، (ئەردە.) قەباڵە و سەنەدی کۆن: بۆ باخ و سامانەکەم ـــ ی باب و باپیرم هەیە.

**بنچاڵ:** ئەوکایەیە، کە لەبن دەخڵی ڕادەخەن. دانەوێڵەیەکە لەگەنم و جۆ، کە لە بنچاڵێدا دەمێنێتەوە و هەڵدەگیرێت، بۆتی دەغڵانە، کە لە چاڵدا گرتبێتی.

**بنچەنەگە:** بیناقاقە، بەربین، تینتینۆکە، بنسەر.

**بنچەنگ** (باک.): بنهەنگڵ، (باک.) بچەنگ.

**بنچەنگانێ** (باد.): زۆرەوانی، زۆرانێ، زۆرخانانێ.

**بنچک:** بنـەدەوەن، یا بنەگیایەکی ئەستوور و پڕوو چرە لە هاویناندا بە سەوزی دەمێنێ و لە پاییزێدا ووشک دەبێ بۆ سووتاندنی هەڵدەگیرێ.

**بنچڵ** (ئەردە.): بن لق.

**بنچنی**(باک.): بنچینەیی.

**بنچین:** دەمار و ڕەگ.

**بنچینە:** ڕەسەن، ڕەچەڵەک، بنیاد، کرۆک، بنجی، بنەڕەت، بناغە، تەوەڵە (بناخە) ی دیوار، بنەوا. ـــ یی: بەریی، (باک.) بنچینی، بنجی، بنیادینی، ڕیشە.

**بنچەرد:** بنەرد.

**بنخەرمان:** دانەوێڵەیەکە، کە لە ژێر خەرماندا دەمێنێتەوە و خڕ دەکرێتەوە، پاش هەڵگرتنی کۆمەڵەکان و دابەشکردنیان هەر چتێکی ماوە ـــ ی پێدەڵێن.

**بنخێو** (هەو.): دووای لێفە و جاجم پێدادان، پەستاوتن و نوشتاندنەوەی کەنارەکانیەتی.

**بنداخە:** قوونت بقووچێنە، کەسێکی لێی بقەومێ پێی دەڵێن ـــ.

**بندار:** (باک.) خانەوادە، جێنشین، نووێنەر، بناوان، بنەوان. قاپ و چتێکە بنی هەبێ. کچێکە بنی هەبێ، کچێکە کچێنی هەبێ، خام، کەچێن. بنەدار، قەدی دار، ڕیشەدار.

**بنداری** (باک.): نووێنەری، خانەوادەیی، بناوانی، بنەوانی.

**بندان** (خۆ.، ڕەوا.): ووردەخۆڵی دووای دابێژتنییە، (دزە.) گەفێکە وەکوو گژنیژییە بە دەستاڕی دەیکەنە ئەستوورک.

**بندەرگە** (کۆ.): داڵان، بێڵایی.

**بندەس:** ژێردەست، نۆکەر. بنکەش، بنکەوش، بنەکەش، بنەنگل، ژێرباڵ.

**بندەست:** ژێردەست، (ژا.) باهوو، بەردەست، بندست، دیل. بنپەلی گیاندار. تەنیشت، بنهەنگڵ. ـــ ی: ژێردەستی، دیلی.

**بندەق:** فندەق. ئەو تەوەرەیە، کە بەرداشی لەسەری دەسووڕێ.

**بندرخە** (هەو.): بێندرخە، هەفتەی دووەمە لە هەشت هەفتەکانی زستانێ لە نێوەڕاستی بەند و مریەمدایە.

**بندروو:** درووماکێکە لە نوشتاندنەوەدا کەنارەکەی لە بنەوە پێوە دەدروون، (باک.) برۆش. جوورە درووێنەیەکە سەپان دەست و داسی لە بنەوە دادەگرێ تا کای زۆر بێ.

**بندریسکە:** گچکەترین پەلەوەرێکی بۆرە، لە نێو پەرژین و باخ و باخچاندا دەژی.

**بندک** (باد.): تەوەرەی ئاش.

**بندن** (باک.): ئاوورگ.

**بندۆ** (موک.): گیایەکە بەووردی بە هەر جێگایەکی داکرێ کێچی نامێنێ.

**بندۆر:** کەسێکە لە بنەوە دروێنە بکات.

**بندۆک:** دۆک، دۆورک، خڵتەی ڕۆنی یا خورییە.

**بندۆکە:** بەندۆکە، گیایەکە.

**بندووگ:** بەردوورگ.

**بندۆڵە** (هەورا.): بنۆڵە.

**بندیان:** بنەفەلە.

**بنڕخ** (باک.): دۆشەگ.

**بنەمەر** (باک.): سەنیری چکۆڵە، نازبالنج. (موک) بنچەنەگە، تینتینۆکە.

**بنەت** (باک.): بست.

**بنەوڵ** (باک.): ژێرکەوش.

**بنەی** (باک.): هەژار.

**بنشانە**: بنۆک.

**بنشەڵتە**: ڕاییخێکە لەژێر دۆشەکی ڕاخرێ.

**بنقورە**: گیایەکە.

**بنقوڵ**: پارچەییێکە لە کراسی ژنان، کە سەرقۆڵی پێدا دەدرێ.

**بن قۆڵتخ**: بنهەنگڵ.

**بن قوڵنج**: بڕوانە: بن قۆڵتخ.

**بنک**: قونچکی جغارە و ئیتر. ماوە، ماوەوە، پاشماوە. (باک.) موور، بنەداری ئەستوور. بناغە. خوارەوەی چت.

**بنکە**: بنە، بناغە، جێگە، دەستوور.

**بنکەزی**: (موک.) بەنپرچ، پرچی لاوە.

**بنکەش** (هەورا.): بنهەنگڵ، بندەست. ـــ ی: گرتنی درزی بەردکاری و خشتکاری بە گێچ یا چیمەنتۆ و ئیتر.

**بنکەفش** (باک.): بن کەوش. بنهەنگڵ.

**بنکەفشانێ** (باد.): زۆرەوانی.

**بنکەلیشە**: بن هەنگڵ.

**بنکەن**: بنکەند، شیّ کردنەوەی بنی دار و درەخت و گوڵان یا دیوار.

**بنکەند**: چتێکە بنکی هوڵوڵ بووبێ. ـــ بوون: هوڵوڵ بوون. ـــ کردن: ـــ کردنی بنکی چت.

**بنکەوتن**: ژێرکەوتن.

**بنکەوش** (ڕەوا.): بنهەنگڵ.

**بنکەی شەڕێ**: بنکە و بناغەی شەڕێ.

**بنکدار**: بازرگانێکە، کە چت بە کۆمەڵ بفرۆشی. قاپ و قاچاخێکە بنکی لە ژێری گیرابێ.

**بنکداری**: بڕوانە: بنکدار.

**بنکڕ**: ـــ ی پەلاو و شیر و ئیتر، چێشتێکە بەبنی مەنجەڵەوە نووسابێ، کرکڕ، (فە.) بنکلاشک.

**بنکراس**: پۆشاکێکە لە بن کراسەوە لەبەربکرێ.

**بنکس** (ئەردە.): بست.

**بنکلاشک** (فە.): بنکڕ.

**بنکلیشە**: بندەست: کابرا چۆتە ـــ ی هەرامەوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی.

**بنکووانوو** (کە.): بن ئاگردان. بنماڵە.

**بنکوچک** (باد.): سەرپۆشی ژنان.

**بنکۆشک**: ژێرخان.

**بنکوڵ**: ئەوەی لەبنەوەی مەنجەڵدا ماوە، بەپێچەوانەی بەرکوڵ.

**بنکێش** (دزە.): دووپارچە پێکەوە هەڵدروون.

**بنگ** (خۆ.): گووفەک، سەرگوویلک.

**بنگە**: بناغەی هەموو چتێک. بۆ باخ و زەویان بەکاردەبرێ. ـــ ی باخ یا زەوی: سەرگەی باخی و یا زەوی، لای بنەوە و خووارەوە، (باک.) بنەگە. جومگە.

**بنگەئێشە**: جومگەئێشە.

**بنگەوور**: چلاو یا کێوێکە بنی بۆلای ژوورەوە دڕی دابێ.

**بنگەھ** (باک.): بنگووێ، بنگوێچکە، بنانگووێ. بنیات، بنج، بنەڕەت، بنچینە. ـــ ی: بنچینەیی، بنیاتی، بنجی، بنەڕەتی.

**بنگەهێن** (باک.): ڕێزمان، دەستوور.

**بنگەی نوگێن**: گەی قامکان.

**بنگرەک** (دەر.): گلێرە.

**بنگرتی**: جێگرتوو، دامەزراو.

**بنگس** (ئەردە.): بست.

**بنگست** (ئەردە.): بست.

**بنگڵ**: ژێرگڵ.

**بنگۆزەڵە**: بنگۆززروان.

**بنگۆزروان**: بنی گیایەکی بەهاری گەڵاووردی وەک شووتییە، سێفەزەمینە شی پێدەڵێن.

**بنگوس** (ئەردە.): بڕوانە: بنگس.

**بنگوست** (ئەردە.): بڕوانە: بنکست.

**بنگووف** (باد.): گەلەخان.

**بنگوڵ**: گیایەکی بەهارییە گەڵایەکانی وەکوو کەرەوزین بە پیشەوە هەڵدەکەنرێ و دەدرێ بە ڕەشەووڵاخان.

**بنگووێ**: بنانگووێ.

**بنگووێچکە**: بنانگووێ، بناگوێچکە.

**بنگێڕی**: بنجووری، پەیداکردن، سۆراخ کردن.

**بن لەرەمە** (بابا.): کوللێرەییێکی ئەستوور و کەم برژاوە.

**بن لەق**: بن چڵ.

**بن لق**: وورده لکێکە لە بەژنی دار و لە بن لکە ئەستوورەکانەوە دەری دەکات.

**بن مل**: ئەو مرازەیە، کە لە کەرەستەی جووتیدا بکەوێتە ژێر ملی گاو ئێستر و هیتر.

**بن میچ**: میچ.

**بنوار** (فە.): بنە، بنچینە.

**بنواشە** (باد.): بنچینە، بناغەی دیواری هەڵکەندراوە.

**بن و بناوان**: بنچینە، ڕەچەڵەک، پڕۆزە.

**بنودار** (هەورا.): میچ.

**بنۆدەس** (هەورا.): بنهەنگڵ.

**بنۆڕە**: بڕوانە، تەماشاکە. (ڕەوا.): کوندەیێکی گچکەیە، کە لە چەند پارچە کوندەیێکی کون و دڕاو دروست دەکرێ.

**بنووس** (قەرە.): نووسەر، نووسیار.

**بنۆسک** (کۆ.): بنێسی.

**بن ووشکە:** نەخۆشییێکی ڕووەکانە، کە لە برکەی کاڵەک و شووتی و ترێزوو و خەیاری بدات ڕەگی هیشک و گەڵایەکانیش زەرد دەکات.

**بنۆک:** (ڕەوا.) بنەرۆک، بنشانە، پاشماوە و گـرێ و گۆڵـی خـوری شانەکراوە بـە بنـەوەی دەنکەکانـەوە دەمێنێتـەوە جا ئـەوگرێ و گۆڵـە، کـە بشرێسرێ وەیا بشکرێتە هـەر چتێـک هـەر بنۆکی پـێ دەڵێـن. گیایـەکی دەشتییە وەکوو تووێسی وایە بە ووردی بە برینی ئاژاڵ و وولاّخاندا دەکرێ چاکی دەکاتەوە.

**بنۆڵە** (بابا.): چتێکی کەمە، کە لە بنە توورەکەیەکی دابێ، بنەۆڵە.

**بنوێچن** (هەورا.): بن بێژنگ.

**بنهاری** (باک.): پرسە، تازیە، تازیانە.

**بنهەنگڵ:** بنـدەس، بندەسـت، گەبـەر، بنـەنگڵ، (ڕەوا.) بنکـەوش، بنکەفش، (باک.) بچـەنگ، بنکـەش، بنباخـەڵ، (هـەورا.) بنـۆدەس، بنکەڵێشە، بنۆدەس، بنچەنگ.

**بنی** (باک.): تەویلە. نێو، دەنێو، دورو، هەندور.

**بنیات:** بنچینـە، ڕەچەڵـەک، سـەرچاوە، بنـای، بنـەتار، بنیـاد، بنەچەکـە، بنگەم، بنیان، بناغە.

**بنیاتی:** بنگەمی، بنچینەیی.

**بنیاد:** بنیات، بنیان، بنچینە، شووێنەوار.

**بنیادینی** (باک.): بنیاتی، بنجی، بنچینەیی.

**بنیان** (باک.): بنیاو، بنیات.

**بنیە:** بونیە، لەش، قالب، توانایی، تاو.

**بنی پێ:** ژێری پێ.

**بنێ تا** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**بنیچە:** بنەچە، خەراج، سەرانە، باج.

**بنێسان:** لە ئەنجامی نەخۆشیدا لەڕولاوازبوون، باریک وبنێسی.

**بنیسک:** پارچە سابوونی گچکە و تەنکە لەپاش شوواری مابێتەوە.

**بنێسی:** بنوسک، لەڕولاوازی، بێ هێزی، بێ تینی، دەردەباریکە.

**بنیشەرە** (هەورا.): دانیشە.

**بنێشت:** بەنوشت، (باک.) بەنیشت، (دەر.، لەک.) جاچک، (هـەورا.) وێژەن، جاجک، جاجکە، جاچکە، چتێکی سپی چیری بەکێشـە، لـە دارەبەن و یا دارەقەزوان پەیدا دەبێ، لە بەهاریدا دارەکە بە تەشوێ برینـدار دەکرێ و لـە قـوری کۆجیلـەیێکی دروسـت دەکـەن و بـە بـەر شـووێنە برینـدارەکەیەوە دەنێن تا پاییزی پڕ دەبێ لە شیرە پێی دەڵێـن بنێشتـەتاڵ، کـە شـل و تاڵـە لەدوایـەدا لـە مـەنجـەڵێکیدا دەدڵۆپێنـرێ و لـە نـاو کیسەیێکی خامی دەکەن و دەینێرنە بازاڕ.

**بنێشتەتاڵ:** (دەر.، لەک.) جاچکە تاڵ.

**بنێشتۆکە** (کۆ.): پنجە گیایەکە گەڵای سپیە، گەڵاو لاسکەکەی وەکوو بنێشت دەجوورێ.

**بنێشتی کەرێ:** گیایەکـە شـیری لێـدێ، کـە مـەیی ڕەش دەبـێ دەبێتـە جیر(جیل) لاستیک.

**بنیلە:** کوڵۆش خستنە ژێر پێی گاگێرەوە لـە دەوروبـەری خەرمانـەوەو لـە ناوەوە تا باش ووردی بکات.

**بنیوان:** بناوان، بنەوان.

**بۆ:** مرازی تەرخانکردنی چتێکە بەکـەس یا چتێکی ترەوە، (هەو.) لـۆ، (هەورا.) پەی، (باک.) ژ، بۆنا، (لوڕ.، دەر.) ئـەڕا، ژۆ، لـەبۆ، پـەری، پەرێ، ڕا، ڕای، ئەم پێنووسە بۆ تۆ هـاتووە، دەبـڕۆ بۆ ماڵـەوە، بۆمـن، بۆ تۆ، بۆوی، بۆمـە، بۆئێوە، بۆوان، لـەباری پرسیاردا (واتـا ئـامرازی پرسیارە)، بۆچ، بۆچی، لۆ؟، لۆچی؟، سـەبارەت بـەچی، (سوور.) چرا، چۆن، چلۆن، (لوڕ.، دەر.) ئەڕا، چی، (باک.) چەما. (هەو.) بۆن، بۆی، (ئەردە.) لە، (ژا.) بێ، ببێ، یاخووا ببێ، (ڕۆژ.) وەرە، (ئۆ.) یـەک. (خۆ.) دێراوی تووتـن و دوکانی بێستانانە. (شن.، مـەن.) چـەوری، چەورایی. (موک.) ــ دان: چەرورکردن، ڕۆن تێکردن. لەبەر، بەهۆی.

**بوو:** بۆ ڕابردووی کەسی سێیەمی تاکە لـە (بوون) وەرگیراوە، (دەر.، هەورا.) بیێن، بۆن. کوند، بایەقوش، کوندەبەبوو.

**بووئا:** بووعە: مۆرانە، زیندەواری گچکە.

**بووبایە:** بووبایێ.

**بووبایێ:** بووبایە.

**بووارچ** (ژاوە.): بڵێ، بێژە.

**بوواچۆ** (ژاوە.): دەڵێم.

**بووار:** بـار، بڤـار، بـۆر، (بـاک.) بهـۆر، (شەم.) بهـوور، بگـار، (جـا.) بۆری، بڕ، بڕی چۆم و ڕووبـاران، بگـار، ڕووز، ڕێـواز، گوزەرگا. (خـۆ.) بەهار. ــ ی: باری، بڤاری. بەهاری.

**بووارەکانی:** کانییەکە بەهاران بژیەتەوە، (هـەورا.) هانەدرۆزنـە، (دەر.) ووهارەکێنی، بەهارەدرۆزنە، کوێرەکانی.

**بووارتن** (باک.): بوواردن.

**بوواردن:** هەڵبوواردن. بە جێهێشتن. بەخشین، (باک.) بووارتن.

**بووازوو** (ئەردە.): بۆژژ.

**بووان:** بخوێنە، بخوونە.

**بووانک** (خۆ.): مێتوولە، مێتوولکە.

**بووایێ:** بووبایە، بووائێ، بووایە. دەبوو، دەبووایە.

**بووەتەڵە** (هەورا.): کوندەبەبوو.

**بووەرە** (هەورا.): بخۆ.(هەورا.) وەرە.

**بووەرەی** (هەمە.): بێنە.

**بووەرێ** (هەورا.): بخۆ.

**بووەکەرە:** کوندەبەبۆ.

**بووەکووێرە:** کوندە بەبوو.

**بووبا:** بووبایە.

**بووبەرامە:** بۆنخۆش، بۆنی ڕەوان و خۆش.

**بووبەرەوەدان:** بۆدان.

**بوورەوودەمی** (هەورا.): بۆنی زار.

**بۆبا:** ڕون کە با و هەوای لێ بدا بۆ با دەبێ.

**بۆبڕد:** بۆن برە.

**بۆبردن:** بۆ . . . ی بردن. بۆنکردن. گومانکردن.

**بۆبرش:** بۆکەڕوو، نان و گۆشت و ئیتر.

**بۆبک** (باک. ): بەبە. بووکە چینی و ئیدی.

**بۆبلات** (باک. ): کارەسات، هەنگامە، بەدبەختی، کۆستی گەورە.

**بووبیش** (باد. ): شوورێنی زەبەندی دێم.

**بۆپرووز** (هەورا. ): بۆکڕووز، بۆنی سووتانی خوری و موو.

**بوت:** (باک. ) بت. ــــ پەرست: بوت پارێز، دیلۆڤان. ــــ پەرستی: بوت پارێزی، دیلۆڤانی.

**بۆت:** تیرەیێکی کوردە لە باکووری زێی بادینان‌دا هەزار و پێنجسەد ماڵ دەبن. ئاوبارە. (باک. ) لوولەی دار هەڵقەندن. تێراوکردن. (باد. ) دارێکی درێژە ناوەکەی وەکوو پلووسک هەڵکەنرابێ.

**بۆتاف:** ــ کرن: لە تەویلەدا کا و پەین و پاڵ بە جێگای وولاّخاندا کردن، (باک. ) بۆتاڤۆک.

**بۆتان:** نێوی هەرێمێکی کوردستانە و بەو خێڵەش دەڵێن، کە لەوێ دان، لە ناوەڕاستی کوردستانێدایە، چیای جودی (گۆدی)ش هەر لەو هەرێمەدایە. نێوی نێرینانە. ــ ی: زاراوەو یا شێوەی پۆشتەمەنی خاکی بۆتان. جوورە درووماێنکە. چەشنە هەڵپەڕینێکی تایبەتی وانە.

**بۆتاڤۆک:** بڕوانە: بۆتاف.

**بۆتە** (باک. ): بۆتۆ، لۆتۆ. گەم، گاه، بووتە. کاسەیێکی گلێنەیە زێڕ و زێوی تێدا لەناو ئاوریدا دەتووێنرێتەوە.

**بۆت بۆت** (باک. ): باڵندەیەکە.

**بوت پەرست:** بوت پارێز، بت پەرست. ــ ی: بوت پارێزی، بت پەرستی.

**بوتری:** شووشەی دەرمان و نەوت و مەی تێکردنێ. دەسکەلە، بوتڵی.

**بوتخانە:** بوتکە، بۆتکا، بتخانە، پەرستگای بوت.

**بووتک** (باد. ): پلووسک، دارێکی هەڵکۆڵراوە، لەسەر بانان و شوورێنی تردا ئاوی پێ دەگوێزرێتەوە.

**بۆتکا** (بۆدکا): خێڵێکی کوردە لە ئێلی هەڤێرکانە.

**بۆتی:** زاراوە و یا چەشنی پۆشاکی بۆتان.

بوتری

**بۆتیمار:** خەمەخۆرە، ماسی گرە.

**بۆجەوت:** کوندەی ئاوێ، کە بۆ خۆشکردن لەناو جەوتیدا بهێڵنەوە لەپاش چەند ڕۆژێکی بۆنی جەوتەکە دەڕوات.

**بۆجی** (باک. ): کوجیلەسەگ، سەگی گچکە، (باک. ) بۆنجی.

**بۆچ:** بۆ، لۆ، لۆچ، لۆچی، بۆچی، (خۆ. ) ما، (ڕۆژ. ) بەی، چی، لاچێ، چرا، (باک. ، سوور. ) چەرا، (لو. ، دەر. ) ئەڕای چی، (ئەردە. ) بوچە، (دەر. ) ئەڕاچووێ.

**بۆچاڵ:** گەنم یا هەر جوورە دەغڵێکی لە چاڵیدا زۆر بمێنێتەوە بۆنی چاڵێ دەگرێ، بۆنچاڵ، بۆنێکی ناخۆشە.

**بووچان** (ئەردە. ): بووچکلاّنە، کوچولّوو، گچکۆلە. ناوی پیاوانیشە.

**بووچە:** بۆچی، لۆچی، چەرا.

**بۆچەک:** بۆچرووک.

**بۆچەکەوەڕ:** بۆچرووک.

**بۆچەکەوور:** بۆ چەک و هۆڕ.

**بۆچەک و هۆڕ:** بۆ چەکە ووڕ.

**بۆچەووک:** کە چەوری بڕژێتە نێو ئاورییەوە. ــ ی لێ دێ، بۆنی چەوری سووتاو.

**بۆچک:** دارایی، سامان. قوڵە، کلک کورت. کوجیلە سەگ.

**بوەچک:** (فە. ) بیچک ، گچکە، چکۆڵە.

**بوچکە:** گچکە، چکۆڵە. قامک. کلکی گیانداران.

**بوچکەلاّنە:** بچکۆلاّنە، نزم، سووک.

**بوچکەوبوون:** گچکەبوونەوە، نزم و سووک بوون.

**بوچکەڵە** (ئەردە. ): گچکە، چکۆڵە.

**بوچکتر:** گچکەتر، کەمتر.

**بوچکلاّنە:** بوچکەلاّنە.

**بۆچووم** (باک. ): داخ، دێخ، خەت، دێر. دێغی خەنجەر و تیغان، دێخدێخ.

**بۆچی:** لۆچی، چما، (باک. ) چرا، (سوور. ) چەرا، چرا، پچی، وەروورچیشی، (هەورا. ) پەی چێش. (شکا. ) چرە، ئەڕاچووێ.

**بوحشت** (باک. ): بەهەشت.

**بوخ:** بوغی گەرماوێ یا بیران. ــ گرتن: گیا بوخ و بەڵغ دەگرێ.

**بوخار:** (باک. ) بووس، بوغ، بوخ. ــ ی: دووکەڵکێش، دووکێش، موغەیری.

**بوخاری فەرەنگی:** سۆبە و کوورەی فەرەنگی.

**بوخاز** (هەو. ): باڵندەیێکە لە چوڕەی گچکەترە.

**بووخاک** (باک. ): فوولێکردن، دەمدان.

**بۆخاو:** بەنخاو، گۆشت و یا هەر چتێکی کەم برژابێ بۆخاوی لێدێ.

**بۆخاوە:** بوغاوە، (دەر. ) برک، گیایەکی بۆنخۆشی کێوییە بۆ بۆنخۆشی و پارازتنی لە مۆرانە بە جلکان وەردەکرێ.

**بووخەتری:** گیایی، گیواوی.

**بوختان:** دەسەهەڵبەس، دەلەسە، درۆ، چەفتە، تۆمانج، شەڵتاخ، پەو (شەق. )، چتی وێنەچوو هەڵبەستن بۆ ئەم و ئەو. ــ پێکردن: تۆماندن

**بۆختک** (باک. ): پلووسک، سوولاّروک.

**بوختیان:** بوختان.

**بۆختیەیش:** لەسەدەی چاردەمینیدا بە بەختیاریان کوتراوە.

**بوخچە:** بەستەیەکی گەورە جل وکەل و پەل لەناو پەڕۆیەکی گەورە نان بە پەڕۆیەکە دەڵێن: ــ. ــ ی جلان: شاڵماشتە، بەسە، بەستە، (ڕۆژ. ) پیارزگ.

**بوخچەگەردان:** بوخچە بە گەردانێ.

**بوخچەبەگەردانێ:** جوورە گەمەیەکە دەستەیەک بە کۆمەڵ دادەنیشن بوخچەیەکی بۆ یەکتری داوێن، یەکێک بەدووری بوخچەکە دا ڕادەکا لە دەرەوە لە دەستی هەر کەسێکی بیگرێ ئەو کەسە وەکوو وی تێدەکەوێ.

**بوخچەی نەکراوەوە:** پیاوێکە هەرکوڕ بێ و هێشتا ژنی نەهێنابێ.

**بوخچک:** بوخچەی گچکە.

**بووخووەش:** بۆنخۆش. ـــ ی: بۆنخۆشی.

**بۆخۆشکە** (هەورا.): کەنێرە، گیایەکی بەهارییە لەگەڵا و شێوەدا وەکوو سێپەرە وایە، بەڵام کەنێرە بۆنی خۆشترە، دەڵێن بۆن لە کەنێرە کردن نەخۆشی گرانەتا دێنێ.

**بۆنخۆیی** (هەورا.): باسمە، بێخوویی، دەردێکی بە ناڵۆشە بەچارەدەکات.

**بووخێر** (باک.): هێشووی چکۆڵە و سەوز.

**بۆدار:** بۆندار، بوودار، بۆ توو‌تن و هەموو چتێکی بۆدار دەست دەدات. ـــ ی: بۆنداری.

**بۆدان:** گەنم و کونجی و قاوە بۆ دەدرێن، نیوە برژاندن، (موک.) نیوەبرێژ، بۆن پێدان، بۆندان.

**بۆدانەوە:** بۆندانەوە.

**بووده‌لە:** نابووت و پووچەڵە، نەزان و گێل و وڕ و تێنەگەیشتوو.

**بۆدەمی** (هەورا.): بۆنی زار.

**بۆوبۆچک** (باک.): تاجی باڵندانە.

**بۆدڕ:** بۆندڕ، بۆدڕن.

**بۆدرە:** پۆدرە.

**بۆدڕن:** بۆندڕن، دڕن، قرتک، بۆنێکی ناخۆشە لە مرۆڤانی سارد ویا چڵکن پەیدا دەبێ بەتایبەتی لە بنهەنگڵ.

**بۆدکا:** بروانە: بۆتکا.

**بۆدل:** حۆل، گێل، گەوج، نەزان.

**بۆدلە:** بۆدل. گەوج، ـــ یی: حۆلی، گێلی، نەزانی.

**بۆدووکەڵ:** چتی دووکەڵاوی بۆنی دووکەڵی لێ دێ، جوورە مەشکەیێکیشە، کە لە زستانانداا لە بن میچی خانوودا هەڵدەوا سرێت (دۆزنج) دەگرێت بۆ ئەوەی تام و بۆنی دۆیەکەی خۆشبێ، ساتا ماوەی چەند ڕۆژێکی بۆنی دۆیەکەی بۆ دووکەڵی لێ دێت.

**بۆدینە:** پنک، پو، پونگە.

**بۆڕ:** ١) گەورە، بەقەڵافەت، هەراش. ـــ بوون: هەراشبوون. ـــ خواردن: بەزین، تێشکان، قژبوون. ـــ دان: بەزاندن لە وتوووێژ و یاریدا، قژکردن. ٢) زللە، شەقەزللە، گوێ کێشان. ٣) (ڕەوا.) سفت. ٤) کەما: گیایەکە کارگی خواردنێ دێنێ. ٥) زۆر و پڕ و تێکچڕژاو بۆ شینایی و باخچە و باخ و جەنگەڵ بەکاردەبرێ. ٦) جێگایەکی فێنکە لە ژێر پەوش و گەڵایاندا و یان لە زەویدا دروستدەکرێ تا میوەی تێدا هەڵگرن. ٧) بۆڕ خواردوو، قژ، بەزیو.

**بووڕ** (باد.): بووار.

**بۆر:** نیشانەیێکی گچکە لەسەر هەندێ تیپی عەرەبی دادەنرێ، (لو.، زەن.) (چووکڵە) ( ْ )پێش، (دەر.) بەر، (هەورا.) بۆر بۆر. (باک.) بووار، بری چۆم و ڕووباران. ڕەنگی بۆر، ڕەشی گەوور، گەووڕ، ڕەشێکی سووکە بە سپی بڕوانێ، سپی چڵکن، شەوڕەنگ، ڕەنگێکە وەکوو ڕەنگی خۆڵەمێشییە. (باک.) بوور، بەیار. تەریق، شەرمەزار، سەرشۆڕ.

**بوور** (باک.): جوورە عەرەبانەیەکە. بیبوور. (کرما.، هەورا.، شکا.) بەیار: زەوییێکە یەک دووساڵ یا قەت نەچێنرابێ. جێگایەکە لە زەویدا چاک دەکرێت مێوی تێدا هەڵدەگیرێت و پەوش و پەڵاشی لە دەوور دادەنرێت.

**بوورا** (باک.، سوور.، شکا.، باد.): ژن برا، برای ژنییە.

**بووران:** بێهۆشی.

**بوورانەوە** (کە.): بێهۆش بوون.

**بووراندن:** بەخشین، چاو لێ پۆشین.

**بووراهی:** بۆرایی، بۆری.

**بووراق بوون:** واق وڕ و سەرگەردان بوون. دڵمردوو، دڵمردگ.

**بۆراک** (باک.): لیک. وورنیش.

**بۆران:** (باک.) بایێ دووژوونییە، بارانە یا بەفرێکە بەدەم باوە ببارێ، شڵێوە، ڕەهێڵە، تۆف. بای سەخت. کاتی باو بارانەی سەخت.

**بۆڕان:** بۆڕین.

**بۆرانخانە** (باک.): کۆترخانە.

**بۆراندک** (باک.): گوویزەرەوە.

**بۆڕاندن:** هەڵین، بۆڕەکردن، قۆڕاندن، قووڕاندن، کۆڕین (بۆ ڕەشەوولاخ).

**بۆراندن** (باک.): تێپەڕاندن.

**بۆرانی:** جوورە چێشتێکە لە هێلکە دروست دەکرێ. سوورکراوەوە.

**بۆرانی باەجان:** بۆرانی باینجان.

**بۆراو:** چێشتێکە لە برێشی گەنمی برژاو دروست دەکرێ و ڕۆنی داغیشی بەسەردا دەکرێت.

**بۆرایی:** بووراهی. چوونایی، چوونە.

**بۆڕە:** دەنگی بەرزی ڕەشەوولاخانە، قۆڕە، قووڕە. ـــ لێ هاتن: بۆڕاندن.

**بۆڕە** (هەورا.): بخۆ. جوورە خوورییەکی پیشەگەرێتییە، (باک.) پۆرانک. بۆسەگ یا وولاخێکی بەرزە بەکاردەبرێ، کە بۆر بێ وە ڕەنگی خۆڵەمێشی بچێ. بوور، بەیار، زەوی نەکێڵراو.

**بوورە:** بوور، بەیار.

**بۆرەبنار:** دەمقاڵی.

**بۆڕەبۆڕ:** قۆڕەقۆڕ: دەنگی ڕەشەوولاخانە، بۆڕەی یەک لە دووای یەکتری.

**بۆرەپنە** (ئەردە.): قەلەباچکە، قشقەڵە، قەل، قەلەرەشکە.

**بۆرەپیاگ:** پیاوێکە ناسراوبێ.

**بۆرەپیاو:** بۆرەپیاگ. پیاوێکە ناسراو و دیاربێ. ناکەس، بەدنەژاد، پەست.

**بۆرەجرە:** باڵندەییێکی بۆرە وەک فشەکلاونە بەڵام ئەم بێ کڵاوە و بچوکترە.

**بۆرەخزم:** خزمی دوور.

**بوورەدێر:** قوڕاو، ڕووسە، زەوییەکی دێم و ڕەقە و بۆ ئەوەی نەرم بێ ئاو بدرێ تا بکێڵرێ.

**بۆرەژان:** ژانە زگێکی سووکە.

**بۆرەسووار:** سووارێکە ناسراو و ناوداربێ.

**بۆڕەشکە** (خۆ.): تۆوی پیوازی.

**بۆڕەقانی** (هەورا.): گیای سوورکراوەوەیە لە ناو ڕۆن و هێلکەدا.

**بۆڕەقنە**: چێتکە کەمێک بۆربێ، بۆرکاڵ.

**بۆڕەک**: جوورە گێچێکی زۆر ووردو سپییە. (باک.) جوورە کولێرەیەکی شەکرییە بە بادام و گوێز و هەنگوین و قیمەوە دروستەکرێ. باڵندەیێکی بۆری گچکەی کێوییە، بۆرەجرە.

**بۆرەکەیی**: تیرەیێکی کوردی جافە.

**بۆرەلووک**: بۆرەقنە.

**بۆرەوە** (هەورا.): وەرەوە.

**بۆرەی خاڵخاڵ**: وولاخێکی بەرزەی سپییە و خاڵخاڵە.

**بۆربۆرک** (باک.): بازگەو بوواریکی گچکەیە.

**بورت**: کۆچ. ــ کردن: کۆچکردن.

**بورج**: بورجی ئەستێران، برج، کۆنگرە، شەموماکوک، بورگ، (هەورا.) پیک.

**بۆرچیل** (ئەردە.): ڕەنگی ڕەشکەوەیە لە ڕەنگی چارەوێدا.

**بۆرچین**: بۆرچیل، سۆنە، مراوی مێیینە، سەرسەوز. (کەلا.، هەورا.) باڵندەییکە پەڕەکانی سەری ڕەنگینە هێندەی مریشکێکییە لە قەراخ ئاوان دەژی ناوی مراوی نێرە، ڕاوکاران بەشەو دەتوانن بیگرن یا بیکوژن. (ئەردە.) مراوی سپی.

**بۆڕخوواردن**: دەمکوت بوونی یەکێک لە ئاخۆتن و ووتووێژدا، تێشکانی یەکێک لەگەمەیەکیدا.

**بۆڕدان**: قۆکردن، بەزاندن، زەبوونکردن.

**بووردن**: بوورین، بەخشین، خۆشبوون، جەبە، (کە.) نۆبەخش. لێ ــ : بەخشین، لێ خۆشبوون، خۆشبوون، چاولێ پۆشین. لەخۆ ــ : خۆکردنە قوربانی.

**بوورژان** (هەو.): وەنەوز، (دەر.) بوورژیان، (هەو.) بۆرژک، قنگەخەو.

**بوورژانەوە** (هەو.): لە بیرە خەو چوونەوە، وەنەوزەدان، چاولەبیرەخەودا.

**بووژک** (هەو.): وەنەوزە.

**بووژن** (موک.): گریانێکی پرسۆزە، کە لە پرپا بێت. کوولژن، گابۆڕ، گریان و ڕۆڕۆ، (باک.) دەنگی وولاخانە، گالۆڕ، گریان و ڕۆڕۆ.

**بوورژیان** (دەر.): وەنەوزە.

**بورغوو**: بورغی.

بورغی

**بورغی**: بورغوو، پێچ، بزمارێکە لەنووکییەوە تا نیوەڕاستی یا تا سەری پێچپێچ بێ.

**بورقنە**: بروانە: بۆرەقنە.

**بورگ**: بورج، کۆنگرە.

**بورمان**: دەنگکەمەناری ووشک بووەوەیە.

**بورو** (باک.): برۆ، هەرە.

**بۆری** (هەکار.): بوواری ئاو، (باک.) بۆڕی، لوولەی ئاسن و چتی تر. ڕەنگی بۆر، بۆرایی، بۆراهی، (باک.) جوونایی.

**بۆریّ** (هەورا.): وەرە، بێ، بەو، بۆ.

**بووریّ** (لەک.): وەرە.

بۆڕی

**بۆڕی**: لوولە، بالۆل، (باک.) تیرک. بۆڕی ئاویّ یا کوورەی، سەنەو، بەربانگ، بۆڕی، (باک.) بۆریک. کێشین. ــ شایلۆغان بۆڕی مۆزیکە، سیّ دەنگ، کەرەنا. ــ پێشمەرگە: بۆڕی سوپایی، بۆڕییە.

**بوریە** (فە.، لو.): برۆ.

**بۆڕیە**: بۆڕی، لوولەی ناو هوڵۆڵی کوناودەرە لە شووشە، تەنەکە، ئاسن یا گڵی سوورکراوەوە.

**بۆڕیەژەن**: بۆڕی لێدەر.

**بۆڕی پشوو**: قرقرتۆک، زمانۆک.

**بۆڕی چکۆڵە**: لوولەی چکۆڵە، دارۆپی.

**بۆڕی چێکەر**: بۆڕی ساز.

**بۆڕی ژەن**: بۆڕی لێدەر.

**بۆڕێش** (ئەردە.): بروێش.

**بۆڕێشین** (ئەردە.): چێشتی بروێشی.

**بۆڕیک** (باک.): لوولە.

**بۆڕی گووێ**: کون و لوولەی گووێچکە.

**بۆڕین**: بۆڕەبۆڕکردن. ڕکە، ملە.

**بۆرین**: چناویەرد، بوورین، خۆشبوون، بەخشین. تێپەڕین، ڕابردن.

**بوورین**: ڕابردن، تێپەڕین. بەخشین، لیّ بوورین، بووردن، چناویەرد. دەفیلەی پێشمەرگان.

**بوورینەوە** (هەمە.): بڕینەوە.

**بوورینۆ** (باک.): تێپەڕین، ڕابردن.

**بۆرینی**: تێپەڕین، ڕابردن. دەمەکی.

**بۆڕیۆ هەناسەدانیّ** (هەورا.): بۆڕی هەناسەدانیّ.

**بۆڕیوە** (هەورا.): وەرەوە.

**بۆڕی هەوا**: قرقرۆچکە، قرتقرتۆک.

**بۆز**: پیاوێکە ڕیش و سمێڵی سپی تێکەوتبێ. جوورە ڕەنگێکی ڕەش و سپی تێکەڵاوە زۆرتر بۆ وولاخان بەکاردەبرێ، هەشنبۆز. (باک.) مەرێکە سەری بۆربێ. جارجارە بۆ دوو ڕەنگی تێکەڵاو بەکاردەبرێ، ساهەر ڕەنگێکی بن. ڕەنگی نیلییە، کە بە سپی بنوێنێ.

**بووز** (بابا.، هەورا.): چووز. ــ پێوەکردن: چووز پێوەکردن، (موک.) دارتۆفانە، ناڕوەن، دارێکە، دارەبووز، بەووز، بزۆ، (باک.) بزوو.

**بۆزا** (باک.): نێوی ئافرەتانە.

**بۆزان**: نێوی نێرینانە.

**بۆزاهی**: بۆزی.

**بووزە** (هەورا.): بزن.

بووزە

**بۆزە**: ڕەنگ بۆز، بۆ وولاخ و بەرازیش بەکاردەبرێ.

**بوزڵە** (هەورا.): کاریلە.

**بوزۆ** (هەو.): نێوی نێرینانە. مرۆ یا ماڵاتێکە تووکی دووڕەنگ سپی و ڕەش بێ.

**بووزوو:** کر، (ڕەوا.) بووزی، (کە. جا.) شەل، (هەورا.) گلێم. قاب شۆر.

**بۆزێ** (باک.): نێوێکە بۆ پیاو و ژنان دەست دەدا، جارجارەش نێوی ئافرەتانە.

**بووزی** (ڕەوا.): بووزوو.

**بۆژان:** بوورژان.

**بووژان** (موک.): بێژان، گیایەکە.

**بۆژانە:** گیایەکی گەڵاووردی لاسک درێژە گوڵێکی بۆری گچکە دێنێ، بۆنێکی توندی هەیە بەناو جل و بەرگدا دەکرێ تا لە مۆرانە بپارێزرێن.

**بووژانــەوە:** ژیانــەوە، ڤژانــەوە، ڤــەژین، گــەش و بــاش بوونــەوە، وەهێزکەوتنەوە، وەخۆهاتنەوە. لە هەژاری ڕزگاربوون، بارسووک بوون، (باک.) پەرنسین.

**بووژاندنەوە:** (باک.) پەرنساندن، بارسووک کردن. ژیاندنەوە، ڤەژاندن، ڤژاندن.

**بووژە** (گژ.): بێژە، بڵێ.

**بۆژە:** ڕق، قین، کین، ڕک، پشم. بۆژژ. ـــ کردن: ڕق و قین هەڵگرتن. بۆژژ کردن.

**بووژما** (باک.): بەدبەخت، پەرۆشدار، هەژار.

**بووژمان** (باک.): پۆشمان.

**بۆژۆ:** (باک.) دەغەڵ، (ڕەوا.، باد.) بۆگە، (باد.) گەندەژ، گیایەکە بە پێوە یا بە درواوی ژاکابێ ویا ئالیکێکە لەبەردەمی وولاخاندا مابێتەوە. کری ڕانک و چۆغەیە.

**بۆژۆکردن:** گەچراندن، ژاکاندن بۆ گیاوکا. بێزارکردن، جاڕس و هەراسان کردنی کەسێکی.

**بووژێنەوە:** زیندووکەرەوە.

**بۆس:** ماچ، ڕامووس.

**بووس** (باک.): بوخار، بورغ، بووغ، شەپۆلی گەرما.

**بۆسار:** بۆسارد، بۆنی ناخۆش.

**بۆسارد:** (هــەو.) بۆنســارد، بۆنــی زۆر نــاخۆش، هــەر خۆراکێکــی بۆنــی تێکەوتبێ.

**بۆساردی:** بۆنساردی.

**بۆسان:** بێستان.

**بووسان** (هەورا.): نوستن، وەرکەوتن، خەوتن.

**بۆسە:** مــەڵاس، سیپە، کەلەبەر، کــەمین، کــەلێن، پــەیجۆر، میــل، حەشارگە، بازگە، کۆریت، کۆلیت، بۆ ڕاو یان بۆ ڕاو و ڕووت و کوشتن ویا گرتنی کەسێک. بۆسەی جووتی، (ڕۆژ.) چەمــەرە. (کــور.) وێژامــەر، مرازێکە لە کەرستەی جووتیدا.

**بۆسە:** بووسە، ماچ، ڕامووسین.

**بووسە** (باک.): ئاڵقەیێکە لە ملی گایان دەکرێت.

**بۆسەخوواردن:** بووسەخوواردن.

**بۆسەگر** (باد.): ئەوەی خۆی مەڵاس دابێ.

**بۆست** (باک.): بست.

**بۆستان** (هەمە.، دەر.): بێستان.

**بۆسۆ:** (هەو.) بۆنسۆ، (هەورا.) بووشمین، (باک.) بێسوو، بۆنی پەرزی سووتاو، پەرزی سووتاو بۆسۆی لێدێ.

**بۆسۆ لێهەستان:** بریتییە لــە بڵاوبوونــەوەی دەنگ و باسێکی ناشیرین لــە یەکێکەوە.

**بۆسۆ لێهەڵنەستان:** مەبەس لە کەسێکی زۆر ڕووت و هەژارە وەکوو دەڵێــن فیسارەکەس ئەوەندە ڕووتە ئاووری تێ بەردەی بۆسۆی لێ هەڵناستێ.

**بۆش** (هەمە.): بڵێ، بێژە، (هەمە.) بووشە. (باک.) زۆر، گەلێک، بۆ گیانلەبەران. هوڵۆڵ، چۆڵ. باش، چاک، باش و بۆش.

**بۆشاهی** (باک.): زۆری.

**بۆشیی:** چۆلی، هوڵۆڵی.

**بووشە** (هەمە.): بڵێ، بێژە، بۆش.

**بۆشکە** (ئەردە.): بەرمیل، چەڵەنگ، چەلیک.

**بوشکول** (باک.): پشکەڵ، پشقڵ. خەم، پەرۆش.

**بوشمین** (هەورا.): بۆسۆ.

**بۆشتلخ:** کۆک، پۆشتە، بالآبەرز. ـــ ی: کۆکی، پۆشتەیی.

**بۆشی** (بــاک.): زۆری. بۆشایی، چۆلی، هوڵۆڵــی، ڤــالاتی، ناوەڵــەی، خۆڕایی.

**بۆرغ:** بۆنگچی. (باک.) گارگامێشی چاوسوور.

**بــووغ:** برک، بووخ، (بــاک.) بــووس، هــەڵمی گــەرما و بــیرو ژوورێکییــە هەوای پیس بێ.

**بۆغاریە** (هەورا.): بوخاری.

**بووغلو** (بار.): گیایەکە وەکوو بێژانــی وایــە لــە نێــو شاخاندا پنجــە و بستێک بڵند دەبێ و بۆنی زۆر خۆشە.

**بووغاوە:** بووخاوە.

**بۆغە** (باک.): ناوی پیاوێکیش بووە، کە بە ئازایی و خورتی و مێرانی دەنگی دابۆوە. گارگامێشی چاوسوورە.

**بووغــە** (ڕۆژ.): گابوغــە، هوولــە، (مــوک.) خوولــە، گایەکــە بــەزۆر و شەڕفرۆش بێ.

**بۆغکردن:** هەڵم و شێ لێ پەیدابوون. کردن (فە.) ڕشانەوە.

**بوغمــە:** گــەروو خــڕە، مــلــەخڕە، تــاس. جنێــوە لــە جیــاتی قوزەڵقــورت بەکاردەبرێ.

**بوغن** (ئەردە.): پارچە، تیکە، ئەنجە.

**بوغن بوغن** (ئەردە.): پارچەپارچە، تیکەتیکە، پارەپارە.

**بووغوویر** (باک.): جوورە گوڵێکە.

**بووق:** بۆری، کــەرەنا، شــاخی ماڵاتــان، کــە جاران لــەسەربانی گــەرماویان لێدەدا.

بۆق

**بۆق:** بەق، (باک.) هەفتجار، قرواق، قورباق، (هەورا.) قورباقــە، داعبایەکی پانکەڵــەی چووار پێــی پەڵەپەڵــەی مەلەوانە. دارێکی کێوی و کوورێستانییە تێکوڵــی سوورە و پەلکی شینێکی سپی پاتە وەکوو گــەڵای مورتکــی وایــە، بــەری زەردە و لــە قــەزوانی گــەورەترە، بەرەکــەی بکوترێ و بکوڵێــنرێ دەبێتــە چــرک

(مەلحەم) لەسەری کەچەڵ بنرێ بەری نادات تا چاکی دەکاتەوە، دارەکە بەقەد گوڵی گوڵاوێ بڵند دەبێ. (هەو.) گوڵی دەخڵییە لە نێو کیفەکەی، کە دەستی بە پەیدابوونکردبێ و بەڵام هێشتا نەهاتبێتە دەرەوە، (موک.) کەپەنکە. (باک.) لاسکی پیوازییە، توولەی مێوی، مارپێچی مێوییە. (ڕەوا.) ــ ی بەلەک: ماسوولکەی بەلەک، ئەستوورایی بەلەک. زەق: چاو ــ : چاوزەق، چاودەرپەڕیو. پاڵ: ــ پێوەنان: پاڵ پێوەنان. (باک.) نێرتکی پیواز و ئیتر. هالاو، هەڵم، بوغ، دەم.

**بۆقە:** دەنگی بەرازییە، مرقە.

**بۆقەبۆق:** جوورە دەنگێکی ڕەشە وولاخانە لە بۆڕە نزمترە. بڵقەبڵقی ئاوێیە، کە لە گۆزە و توونگە و دەفری زارتەنگ بێتەدەرێ.

**بۆقەتە** (ڕۆژ.): ــ ی مل: ئەستوورایی مل، پشتی مل.

**بۆقەمەلە:** جوورە مەلەیەکە وەکوو مەلەی بۆقی.

**بۆقبۆق:** دەنگێکە لە خۆرتی و ئازایەتیە. ــ لە بارام دێ واتا چاوی سوور بووە و ڕاناوەستێ. دەنگی نێری و بەرانانیشە، کە بەردەدرێنە ناو بزنەگەل و مەڕان.

**بۆق پێوەنان:** پاڵ پێوەنان.

**بووق زەوین:** هەڵم، بوغی زەوی.

**بۆقزە:** بڵقی ئاوێ، (هەو.) جوورە زار ئێشەیەکی منداڵانە. ئازارێکە منداڵان تا تەمەنی پێنج ساڵانە دەیگرێ لە هەناریەوە دەیداتە نێو زارییەوە و هەڵیدازڕێنێ بە شیری بزنان و یا بەزاخ و شیری چادەبێتەوە، (هەورا.) پیزووکەردەمی، پیزووکەی دەم.

**بۆقک** (باک.): مست، لارێچ.

**بۆقل** (باک.): بەلەکی لاقی، پووز. نەرم، شل(بۆ گۆشتی).

**بۆقلە** (جا.): قەلەموونە.

**بووقلە** (موک.): قەلەموونە.

**بۆقلەمووت** (ئەردە.): بووقەلەموون.

**بۆقلەموون:** بوقەلەموون، نێرەکەیان خۆی گیف دەکات و سەر دندووکی پارچە گۆشتێکی پێدا شۆڕبۆتەوە.

**بۆقلی** (باک.): باقلەی کێوی.

**بووقمل:** پژمل.

**بووقیان** (لو.): جووڵان، بزووتن، ڕۆیشتن.

**بۆقی مل:** ئەستوورایی مل، پشتی مل.

**بووک:** (دەر.) وەوی، (هەورا.) وەیوە، (باجە.) وەیێ. سوور. خۆزگە، بریا، کاش.

**بۆک** (باک.): تیندار، بەهێز.

**بۆکە** (باک.): ئازا، زاتدار، تیندار، بەهێز، هێزدار، بەهیمەت.

**بووکەبەبارنە:** (باڵە.) شەموولە، کۆسەبەبە، کۆسەوەوی، کۆستەبووکە.

**بووکەبەدارینە:** بووکەدارینە.

**بۆکەبۆکە:** گەورەپیاوان.

**بۆکەردەی** (هەورا.): بۆتکردن.

**بووکەسوورە:** (کۆ.) بووکەسوورکە. باڵندەیێکی چکۆڵەی بەرسینگ سوورە.

**بووکەدارینە:** بووکەبەدارینە.

**بووکەسوورکە:** بووکەسوورە.

**بۆکەڵیقە:** بۆتی نێوقامکی ڕزیوی پێیانە یا ئی بنهەنگڵێیە، بۆدڕن.

**بووکبووکانێ:** (موک.) بووکێنی،جوورەگەمەیەکی منداڵانەیە.

**بووکردگ:** بۆگەن.

**بۆکردن:** بۆتکردن. گەنین، بۆگەنبوون.

**بۆکڕووز:** کڕووز، بۆپڕووز، کزووری، بۆنکڕووز، بێن کوورزیک، موو و خوری سووتاو بۆکڕووزی لێدێ.

**بۆکز:** ماست ــ ی لێدێ، کاتێکی ماست وەیا چێشت، کە زۆر لەسەر ئاوور بمێنێتەوە یابسووتێ ــ یان لێ دێ. چێشتی سووتاو ــ ی لێدێ.

**بوکلە:** بووکی منداڵان.

**بووکک** (باک.): بووکۆکەی منداڵان. گلێنەی چاو.

**بووکلدێر** (باک.): داری ڕازاوەوەیە، کە منداڵان لە(۱۷)ی دێسەمبەرێدا بە بۆتەی سەری ساڵەوە بەکۆڵان وکووچانیدادەگێڕن.

**بۆکلیشە:** بۆکەلیشە، بۆدڕن، بۆتدڕن، بۆتێکە لەبن باخەڵ وناودەمداو لەژێر پێ بێت.

**بووکمار:** داعبایەکی لووس ودرێژو جوانە وەماری دەچێ بەڵام چووار پێی هەیە.

**بووکنی** (موک.): ئەوکەسانەن بەژن وپیاوەوە، کە بەشووێن بووکێدا دەچن بیگووێزنەوە بۆماڵی زاوای. (باد.) پیلک، (هەورا.) پاوەی وەهە.

**بووک و زاوا:** گوڵە مێلاقە.

**بووکۆکە** (کور.): بووکێکە منداڵان گەمەی پێوە دەکەن. (کۆ.) گیایەکە گوڵی سوور دێنێ لە نی خاشخاش گچکەترە لەنێو کیفەکەیدا شیرێکی سپی لێ پەیدا دەبێ کەچی وەدەستی کەوێ سووری دەکات کۆلکەکەشی لەسەر هەرجێگایەکی لەش دانرێ دەیسووتێنێ.

**بووکوومەکەر:** خۆزگە، بریا، کاشکی.

**بووکوومبیلکە** (باک.): باڵندەیێکە لە ئاوێدا مەلەی دەکاو مەترێک بڵندە پەڕی سپییە کیسەیێکی لەژێر ملیدایە جێگای دە لیتر ئاودەبێتەوە وەجارجارە ماسیانیش، کە دەگرێ لەرێیان دەکات.

**بووکێ:** نێوی ئافرەتانە. جووانێ.

**بووکێن:** بووک بووکانێ.

**بۆگە:** (موک.، بابا.، هەورا.) بۆژۆ، (باد.) گەندەژە. بوژە، گیای تام وبۆتگۆڕاوو ژاکاوە، کە ئاژاڵ و ماڵاتان هەربۆتی کەن نایخۆن.

**بووگە** (ئەردە.): بووە.

**بووگەبەماس:** بۆتە مەڵحەم، بووە بە مەرهەم.

**بۆگەن:** بۆگەنیو، بێگەن، بۆتی پیس، بۆتی ناخۆش، کەف، گەنیو، (ڕۆژ.) گەنی، بۆگەندای، (دەر.) بووگەند. بووپیسی(فە.)، زنخ، کفکۆ، گەندەژەبۆ. ــ بوون: گەنان. ــ کردن: گەناندن. (باڵە، پەر.) برایە بۆگەنە (گیا). ــ کردن: بۆتی ناخۆشکردن. ــ بوون: بۆن ناخۆش بوون

**بۆگەنکە** (هەورا.): فسۆس (داعبایەکە). خورماسیچان، مشکی خورمایە. گیایەکە.

**بۆگەندی:** بۆگەنی، گەنیو.

**بۆگەنیک:** بۆگەن.

**بۆگەنیو:** چتێکە بۆنی گەندو خرابووبێ. گەنانراو.

**بۆگەنتک:** جوورە بۆگەنێکە لەمیوەی ڕزیو و هەندێ چتی تر دێت.

**بۆگنخ:** تۆو هەرچتێکی بەتەڕی هەڵگیرێ ــ دەبێ، گنخ. ــ ی: گنخی.

**بۆڵ:** قاحپە، سۆزانی، ئافرەتی حیز، جندە، بەهێشووی تری و خورماش دەڵێن. (شار.، باب.، کۆ.) گلوەتری. زەنگێکی زلە لەملی پیشەنگان دەکرێ. خۆڵەمێش. کورتکراوەوەی ناوی بۆڵییە بۆسەر چاوەکانی ئەم فەرهەنگە. گلوەتری.

**بوول** (لک): خۆڵەمێش، مشکی.

**بۆڵ** (باک.): زۆرەملێ، بەتۆبزی. پارچە مەرێک، پارچە ووشترێک.

**بووڵاو:** ئاوی خۆڵەمێش.

**بۆڵاندن:** بۆڵەکردن.

**بووڵانن:** بۆڵاندن.

**بۆڵە** (هەورا.): گلوەتری. (ڕۆژ.) بڵمە، وورتە، پرتە، ختە، لەبەرخۆوە وورتەکردن.

**بوولە** (ئەردە.): پەخمە، چل، فل، سەپوول، گێل، کەودەن.

**بۆڵەبۆڵ:** کوتە کوت، (ڕۆژ.) بڵمەبڵم. ڕنگەرنگ، جرتەجرت، فرتەفرت، جرت وپرت، جرت وخرت، بۆڵەی یەک لەدووای یەکتری، ختەخت. ــ کردن: فڵتاندن، فرتاندن، بڵماندن.

**بۆڵەتەمە:** بۆڵەتەمێ.

**بۆڵەتەمێ:** ماتەدانی بەری درەخت نیشانەی گەیشتنی، ئەوترێیە بۆڵەتەمەی تێکەوتووە واتە نیشانەی گەیشتنی پەیدا بووە.

**بوولەرزە:** بوومەلەرزە، لەرزەک.

**بۆڵەکردن:** بڵماندن، بۆڵەبۆڵکردن، ختەکردن.

**بۆڵەمێر:** خۆڵەمێشی گەرم، ژیلەموو.

**بۆڵەنمە:** ماتەدانی بەری درەختان: ئەم مێوە ــ ی تێکەوتووە واتە ماتەی داوە.

**بۆڵەنمێ:** بۆڵەنمە.

**بولبول:** بلبل. ــ دەچریکێنێ: (هەورا.) بولبول چریکنۆ. ــ دەخوێنێ: (هەورا.) بولبول موو انۆ. نێوی ئافرەتانە.

**بولبولە** (ڕەوا.): ڕیشوورێک چەند موورووێک هۆنراوەتەوە بەقەد ڕیشوو و پوولێکی زێڕ یا زێوی بەسەرەوەیە.

**بۆلک** (باک.): گۆرانی شوانییە.

**بۆڵکە** (مەریوا.): (هەورا.) ئاڵشت.

**بۆلگ** (جا.): تەپڵی سەری.

**بۆلگە** (باک.): هەرێم.

**بۆڵمازوو** (موک.): جوورە ترێیەکی شینە گلوشی خڕ دەنکدارە.

**بولهەوەس:** هەوەسدار، خاوەندهەوەس.

**بولوسک:** تەوەرە.

**بۆڵێ:** هۆزێکی کوردە لە گەرمێنی دادەنیشێ. گلوەترێیەک.

**بووڵێ** (هەورا.): خۆڵەمێش، مشکی.

**بۆم:** بۆمبا.

**بووم:** زەوی، زێد، نیشتمان.

**بومادەران** (موک.): گیایەکی بۆنخۆشە.

**بۆمارانە:** چڵە گیایەکە بستێک بڵند دەبێ پەلکی وورد و بۆنی زۆر خۆشە و تامی تاڵە بە دەسک لەکەنار و ئاوو دەورووبەری هەرکوویەو کونێکی هەڵبسووڕێ و هەنگی تێکەن بە جێی ناهێڵن و دەیکەنە داڵدەی خۆیان، سیرمۆکە.

بوومەکوێرە

**بوومەکوێرە:** کوندەبەبۆ.

**بوومەلەرزە:** بوولەرزە، زەوی لەرزە، لەرزەک، جم و جووڵی زەوی.

**بوومەمارانی** (بابا.): گیایەکە.

**بۆمبا:** نارنج، نارنجۆک.

**بۆمبائاوێژ:** نارنج ئاوێژ.

**بۆمبای سووتێنەر:** نارنجی سووتێنەر.

BOMB

بۆمبا

**بومچ:** بۆمچک، بۆمچە، بۆگەن.

**بۆمچەو** (هەورا.): بۆ هەرنەمووت، پووچ، وەکوو، گوێزی پووچ و کووێر.

**بوومچەوە:** بومچەو.

**بوون:** بوون مرازی یاریکاری تێ نەپەڕە هەر وەکوو کردن مرازی یاریکاری تێ پەڕە، بوویین، هەیین، دژی نەبوون. پایەداری، هەمیشەبوون، مان. دارایی، هەبوون، هەبوونی ماڵ، دارابوون. کرداری ڕابردووە بۆ دووەم و سێیەم لەباری گەلدا وەکوو ئێوە بوون، ئەوان بوون. لەدایک بوون. گەیشتن، گەیینی میوە و تەرەکاری. ڕوودان.

**بۆن:** بهن، (باک.) بێهن، بووە، (هەورا.) بووی، (هەو.) بێن، (ئەردە.) بۆنە، مایە، دەستاوێژ، بیانک.

**بۆن:** بیهن، بۆ.

**بۆنا** (باک.): بۆ، لۆ.

**بۆناو:** ڕاناو، (باک.) بهنۆک، بۆنی خۆش، گوڵاو، بۆناو لە خۆدان: بهن لە خووەدان.

**بۆنە** (هەورا.): بێ، (مۆک.) هۆ، مایە، توور. بیانوو، بیانگە، بیانک، بەهانە.

**بوونەبوون** (باک.): ڕووشە، قۆرت، هەنگامە، کارەسات.

**بوونەماڵ:** ساغ بوونەوە بەسەر کەسێکیدا.

**بوونەوە:** دووبارەبوون، دیسان ڕوو لە بوون کردنەوە.

**بوونەوەر:** بوون. ــ ی: بوونی.

**بوونەوەرایەتی:** هەبوون.

**بۆن پێدان:** بۆدان، نیوە برژاندن.

**بوونتاف** (باک.): تیشکێکە بە برووسک و ڕەعدەوە بەلاّن نەکەوێتە سەرزەوی.

**بۆنجی** (باک.): تاجی.

**بۆنچاڵ:** بۆچاڵ.

**بۆنخاو** (هەو.): بۆخاو لە گۆشت و چتێکی تر دێ، کە کەمبرژابێ.

**بۆنخۆش:** بۆنی خۆش، خووەی بیهن. (هەورا.) بۆوەش.

**بۆنخۆشکە:** برکە بۆنخۆشکە، بەنەعناش دەڵێن، گیایەکە لەگەڵ شیرێژ یا ماستی ترش بە تێکەڵاوی لەسەر شوێتی مارانگەزتەی دادەنێن.

**بۆنخۆشی:** بۆنخۆشی، بۆومشی.

**بۆندڕ:** بۆگەن.

**بوند** (باڵەک.): بڵند.

**بۆندار:** گوڵی بۆنداره و هەر چتێکی بۆنی لێ بێ.

**بۆنـدڕن:** بۆنـدڕ، بۆگـەن. بۆنێکـی ناخۆشـە لـە ئـەنجامی چڵـک و زۆر ئارەقەکردندا پەیدا دەبێت، بە تایبەتی لە ئێرەوزی مەڕ و ماڵاتە لە وەرزی پەریندا.

**بوندی** (بالە.): بڵندی.

**بۆنسارد:** بۆسارد. ــ ی: بۆساردی.

**بۆنسۆ** (هەو.): بۆسۆ.

**بۆنگ** (دزە.، خۆ.): تێشـو، دەباغ، (باک.) بـەهێز، بەهـەوا. ــ کرن: هاندان، ڕق هەڵستاندن.

**بۆن و بەرامە:** بۆنی خۆش.

**بوونی:** لەروان، گونجان، دەستدان.

**بونیە:** بنیات، بناخە، ڕەسەن، ڕەچەڵەک.

**بۆی منداڵ:** بۆنی منداڵ، منداڵی ساوا تـا دەگاتـە دووساڵی ئەگـەر بۆنی خوێن و خوڕی ژنی زاو بکا بەبۆن دەکەوێ، گیای گژنیژ بە خەنـەوە لـە ڕوو و پێش سەر و دەستەکانی منداڵەکەی بنێ بەسوودە.

**بونیە:** بنیات، چەلم.

**بۆنی منداڵ:** بۆی منداڵ.

**بۆوەش** (هەورا.): بۆنخۆش.

**بوو وەش** (هەورا.): بۆنخۆشکە.

**بووغ:** بڵغ، بۆ ژەنگی مسی بەکاردەبرێ.

**بوهارتن** (باک.): تێپەڕین، ڕابردن. بووراردن.

**بۆهەڕنەمووت:** بۆنی مەشکە و دۆدانەیە، (هەورا.) بۆمچەو.

**بووهووراندن** (باک.): تێپەڕاندن، ڕاپەڕاندن.

**بووهوورتن** (باک.): بوورین، تێپەڕین.

**بووهوشت** (باک.): بەهەشت.

**بووهیشک** (باد.): کێورژ، کۆبیژ.

**بووێ** (ئەردە.): بیێ.

**بووی** (هەورا.): بۆن.

**بۆیاخ:** چەورییەکە، زەرد، سوور، قاوەیی و ڕەش و چەند ڕەنگێکی تری هەیە قۆندرەی پێ بۆیاخ و چەور دەکەن.

**بۆیاخکار:** بۆیاخکەر، بۆیاخچی.

**بۆیاخکەر:** بڕوانە: بۆیاخکار.

**بۆیە:** لەبەر ئەوە، چونکوو. بۆیاغ، چەورییەکە قۆندرە و قایش و چتی پێ بۆیە دەکرێ، بۆیاغ کوردی و تورکییە: بۆ: چەوری، ڕۆن کوردییە، یاغ یـش تورکیە.

**بووی بنەگەڵ:** بۆدڕن، بۆکەڵیشە.

**بووی دەم:** بۆنی زار.

**بۆیەمە** (ڕۆژ.): پارچە کرێکی ڕەشە لە مشکی و هەوری گچکەترە ژنان لەسەری خۆی دەبەستن.

**بوویت:** بووی، بوو ویی.

**بووێر:** هەڵبووێر، ڕۆژبووێر، هەفتەبووێر، شەوبووێر، ساڵ بووێر.

**بۆیخۆش:** بۆنی خۆش.

**بوویژ:** سەردوولکە.

**بووێژ:** هۆز، (بـاک.) هۆزانڤـان، هەسـتیار، هۆنـەر، گۆرانیبێـژ، ئـاخوەر، ئاخەفتەر.

**بووێژە:** بڵێ!، بێژە.

**بووێس** (ڕۆژ.): بنوو، بخەوە، بخەفە. بوەستە، ڕاوەستە، بوویسە.

**بۆیسان** (هەورا.): بێستان.

**بۆیسانەوان** (هەورا.): بێستانەوان.

**بووێسە:** بوەستە، ڕاوەستە.

**بۆیکردگە** (ئەردە.): بۆنی گرتووە، بۆگەن بووە.

**بووی گەن** (ئەردە.): بەگەن.

**بۆیوەش** (هەورا.): بۆنی خۆش.

**بوویی** (باد.): گەیین، گەیشتنی میوە و تەڕەکاری.

**بوویین:** بوون.

**بە** (باک.): بێ، بەهێ.

**بها**(باک.): بەها، نرخ.

**بهار** (باک.): بەهار.

**بهارە** (باک.): بەهاروو، گەنمی بەهاری.

**بهارخێر** (باک.): هەوەڵ شینایی بەهارانە.

**بهانە** (باک.): بەهانە.

**بهەر**(باک.): بەرین، پان.

**بهەڤ** (باک.): پێکەوە.

**بهتر**(باک.): پتر.

**بهستن:** بیستن.

**بهستۆک:** گوێدێر، بیستەر، بهستیار.

**بهستن** (باک.): بیستن، شنەفتن.

**بهستیار:** (باک.) بهستۆک، بیستەر، گوێدێر، ئەو کەسەیە گوێی لـە ئاخەفتنی ئەم و ئەو بێ.

**بهشت** (باک.): بەهەشت.

**بهن** (باک.): فەرامۆشی، ئـارامی. ــ ا مـە هـات: فەرامۆشیمان هات، بۆن، بێن، پشوو. ــ دان وستاندن: پشوودان و ئەستاندن. ــ کشاندن: پشوو هەڵکێشان. ــ ا مـن تـەنگ بـوو: ئـارامم نـەما، حـەجمینم لێ هەڵگیرا. بۆن، بێن.

**بهناڤ** (باک.): گیایی.

**بهنەک** (باک.): دەمێکی، تاوێکی، پشووێکی.

**بهن تەنگ** (باک.): بێن تەنگ، تووڕە، تەنگەتیلکەگرتوو.

**بهندار** (باک.): بۆندار.

**بهندخووەدان** (باک.): خۆ بۆنخۆشکردن.

**بهنژین** (باک.): باوێشک، (باد.) پشمین.

**بهنک**: (باک.) دیوارێکە پارێزگاری سەنگەر و پەسیوان دەکات.

**بهنۆ** (باک.): هێزی بۆنکردن.

**بهنوونی** (باک.): نیلوفەر، لیلوفەر، گوڵێکی سپییە.

**بهنۆک** (باک.): بۆن، گوڵاو.

**بهنۆلێدان** (باک.): بۆنخۆشکردن.

**بهۆر** (باک.): پردەباز، بووار، بڤار، بگار، شوێنێکە لە رووباران، کە مرۆ بتوانێ لێی بپەڕێتەوە.

**بهوور** (شەم.): بووار، بڤار، بگار.

**بهۆست** (باک.): بست.

**بهۆک** (باک.): بێ، بەهێ، بەی.

**بهێڤرا** (باک.): پێکەوە، بەیەکەوە.

**بهێستن** (باک.): بیستن، شنەفتن.

**بهێنە**: بێنە، بێرانە، (هەورا.) باوەڕۆ.

**بێ**: (ب) تیپێکی ئابێی کوردییە. بەهێ، بەی، (باک.) بهنۆک. (ئەردە.، شوا.): وەرە. جگە، بێجگە، هێ. بابێ بۆ کەسی تاکی سێیەمە لەهاتەوە وەرگیراوە. قوڵەکراوەوەی (بێجووان)ە بۆ ناو ئەم فەرهەنگە.

**بی**: دارێکە بێ بەرە. دارەبییە و پێنج جورە: ١) دارەبێ. ٢) شەنگەبی، شۆڕەبی. ٣) زەردەبی (بی زەر). ٤) ڕەشەبی. ٥) سوورەبی. گەڵای تاڵ و باریک و درێژی هەیە. ببێ، ببی، دەبێ. بۆ پاراندەوە و نزایە: یاخودا هەر خۆشبی. بێو. (فە.) بوو. (باک.) دارەبی. بێوەژن. (لو.، شوا.) کاریلە. (دەر.) بوو.

**بیا** (لو.، فە.): وەرە.

**بیابان**: بیاوان دەشتی چۆل و بێ ئاو، بیروون. لەخۆچوو، بێهۆش. ـــ بوون: بێ هۆشبوون.

**بیابانگێڵ** (هەورا.): بیابانگەڕ.

**بێ ئابڕوو**: بێ ئاوڕوو، بێ شەرم.

**بێ ئابڕوویی**: بێ شەرمی.

**بیار** (دەر.): بیبار.

**بێ ئار** (بێعار): بێ شەرم، ڕووداماڵراو. ـــ ی، بێعاری: بێ شەرمی، ڕووداماڵراوی.

**بێ ئارام**: بێ وەقرە، حەجمین لێ هەڵگیراو. ـــ ی: بێ تاوی، بێ وەقرەیی.

**بێ ئاگا**: نابەڵەد، ناشارەزا، هیچ نەبیستوو، بێ خەوەر، نائاگا. ـــ هی: بێ ئاگایی، بێ خەوەری. ـــ یی: بێ ئاگاهی، نائاگایی.

**بێ ئامان**: بێ ڕەزا. ـــ ی: بێ ڕەزایی.

**بێ ئاوروو**: بێ ئابڕوو، بێ شەرم، داماڵیاک.

**بێ ئاورووی**: بێ ئابڕوویی.

**بێ ئایین**: خوانەناس. ـــ ی: خوانەناسی.

**بێ ئەمە**: بەبێ ئەمە، بەبێ ئەوە.

**بێ ئەمەگ**: بی نوورت، بێ وەفا. ـــ ی: بێ نوورتی، بێ وەفایی.

**بێ ئەنوا**: بێ نەوا، هەژار. ـــ یی: بێ نەوایی، هەژاری.

**بێ ئەوە**: بەبێ ئەوە.

**بیانک**: بیانوو، پەڵپ، بەهانە.

**بیانگ**: بیانوو، پەڵپ، بیانک، گەزەک.

**بیانگە** (کۆ.): بیانوو، پەڵپ، بەهانە، وورک، گەزەک.

**بیانوو**: پەڵپ، بەهانە، (دەر.) بیانگە، بیانی، گەزەک. ـــ گرتن: پەڵپ گرتن.

**بیانی** (هەو.): بێگانە، تاجیک. (دەر.) بیانوو، پەڵپ. سۆرەو تۆرە.

**بیاوان**: بیابان، دەشتێکی چۆلی کاکی بەکاکی. بێ هۆش، بێخود. ـــ بوون: بێ هۆشبوون. ـــ ی: بیابانی.

**بیاوەشەرە** (هەورا.): ڕاخستنی بەرەو مافوورە.

**بیایی** (هەورا.): بەستەنی، بەستنی ئاو.

**بێ نوورت** (باک.): بێ ئەمەگ، نانکوێر، بەڵێن شکێن. (باک.) ـــ ی: بێ ئەمەگی، نانکوێری.

**بێ نیپ وزیپ** (باک.): نیگەران، دوودڵ. (باک.) ـــ ی: نیگەرانی، دوودڵی.

**بیەش** (باک.): بەش.

**بیەن** (هەورا.): بووە.

**بیەوێ ونەیەوێ**: بقێ ونەقێ.

**بیبەر** (باک.): بیبار، دەلووبیبەر. دەرمانگەرم، ئیسیوەت.

بیبەر

**بیبار** (هەو.): ئیسیوەت، (باک.) دەرمانگەرم، ئاڵات، بیبەر. ـــ ی سوور: دەلووجە، هەوجهار، (دەر.) بیار.

**بێ بار**: بێ بەر، مرۆی نالەبار و بێ کەلک، بەرنەدەر.

**بێ بارە**: بێ بەش، بەشبڕاو.

**بێ باسک**: بێ کەس، بێدەر. ـــ ی: بێ کەسی، بێدەری.

**بێ باڤ** (باک.): بێ باوکی یا هەتیو، پەست، نالەبار. بیژوو، زۆل. ـــ ی(باک.): بێ باوکی، هەتیوی. پەستی، نالەباری. زۆڵی، بیژوویتی.

**بێ باک**: بێ ترس، بێ پەروا، نەترس. ـــ ی: بێ ترسی، بێ پەروایی، نەترسی.

**بێ باڵ**: هەژار، دەستکورت، بێکەس. ـــ ی: هەژاری، دەستکورتی، بێکەسی.

**بێ باووک**: کەسێکە باوکی نەمابێ. زۆڵ، بیژوو، بیژک.

**بێ بەخت**: بەدبەخت، چارەڕەش، ئاوان، تەپرەش، ناپاک. ـــ ی: بەدبەختی، چارەڕەشی، ئاوانی، تەپرەشی، ناپاکی، نهێن بڕی.

**بێ بەر**: دارێکە بەری نەبێ. ژن یا ماڵاتێکە نەزۆک بێ. کردەوە و سەودایەکە سوودی نەبێ. بێ بەش، بەشخوراو، بێ کەلک، بی سوود، بێ بەر. ـــ ی: بەشبڕاوی، بەشخوراو، دەستبڕاو.

**بێ بەرق**: تار، تاریک.

**بێ بەش:** بەشبڕاو، بەشخوراو، بێ بارە، لێک کراو، دابڕاو. ـــ ی: بەشبڕاوی، بێ بارەیی.

**بێ بەهرە:** بێ بەش، بەشبڕاو، (باد.) زرپەهە. ـــ یی: بێ بەشی، بەشبڕاوی.

**بێ بڕوا:** بێ باوەڕ، بێ بەقا. ـــ یی: بێ باوەڕی، بێ بەقایی.

**بیبک** (باد.): بیبیلەی چاو.

**بیبکە** (بار.): بەبەڵەی چاو.

**بێ بگار** (ئەردە.): قووڵ، بێ بن، بێ پەی، بێ ڕەووز.

**بێ بن:** دەریای زۆرقووڵ، بیرو گۆمی زۆر قووڵ، بێ بگار، بێ پەی، بێ ڕەووز. چتێکی نەبڕاوەوەو بێ دوایی. کچی بێ بن، کچێنی نەماو.

**بیبن** (هەورا.): پشتێند. تەنگە.

**بێبنتار** (باک.): بێ بناوان، بێ کابان، بێ ژن.

**بێ بنی:** قووڵی، کچێنی نەمان.

**بێ بۆ:** بێ بوو.

**بێ بوو:** بێ بۆن.

**بیبۆک** (باک.): بەبەڵەی چاو. گلێنەی چاو.

**بیبی** (هەورا.): بووکی منداڵان، بیبیلەی چاو.

**بیبی چەو** (فە.): بیبیلەی چاو، بەبەڵەی چاو.

**بێ بیر:** بیرخراپ، بێ ویر.

**بیبیلە:** منداڵی تازە بوو و ساوا، بەبەڵەی چاو. (ڕەوا.) ـــ ی چاو: کەشکاچاڵ.

بیبیلەگەرە

**بیبیلەگەرە:** قومقومۆکەی چکۆڵەیە.

**بیبیلەوچەمی:** (هەورا.) بەبەڵەی چاو، بیبیلەی چاو.

**بیبیلکە:** باڵندەیێکی بچووکی بازەڵەی دەشتییە.

**بیبین** (هەورا.): پشتێند.

**بێ پا:** بێ پێ. شەل. ووتەی پووچ، پڕوو پووچ، خۆڕایی. هەوایی.

**بێ پاڵ** (ڕۆژ.): بێ پەنا، بێ کەس.

**بێ پەڕ:** پەڕ وەریو، پەڕنەماو.

**بێ پەرە** (باک.): بەفیڕۆ، بەخۆڕایی.

**بێ پەرگ** (باک.): بە تالووکە، بە لەز، بە پەلە.

**بێ پەروا:** بێ ترس، بێ باک. ـــ یی: بێ ترسی، بێ باکی.

**بێ پەڕ و باڵ:** هەژار و ڕووت و بێدەق. ـــ ی: هەژاری، ڕووتی.

**بێ پەنا:** بێ کەس، بێ پاڵ.

**بێ پەی:** دەریا و گۆم و بیری زۆر قووڵ، بێ بن. بێ ئەندازە.

**بێ پەقنی** (باک.): گەورەیی، هەوایی. گوشادی، فراوانی.

**بێ پۆز:** تەوور.

**بێ پێژن** (باک.): ئارام، هێدی. ـــ ی: ئارامی، هێدێتی.

**بێ پیشە** (باد.): پەلپێنە (گیایەکە).

**بێ پێشگیر:** بێ بەرهەڵست، ئازاد، سەربەست.

**بێ پێش ودووایی:** بێ بەروو دوایی.

**بێ پێڤان:** بێ پێوان، ئێگجار زۆر.

**بێ پێلەکەرە:** قومقومۆکەی گچکە. بیبیلەگەرە.

**بێتا:** ئێوی ئێرینانە، بێ دەزوو، بێ داو، بێ هاوتا، تاک.

**بێ تابی** (باک.): ماندووێتی، بێ توانایی.

**بێتار:** کارەسات، گێچەڵ. ـــ ی: کارەساتی، گێچەڵی. *

**بێتام:** ناخۆش، بێ مەزە. ـــ ی: ناخۆشی، بێ مەزەیی.

**بێتاو:** ڕۆژێکە خۆر بەدەرەوە نەبێ. تاگری بێ تین. یەکسمێکە زۆر ڕانەکات و پڕتاو نەبێ.

**بێتاوان:** بێ سووچ و گوناح، بێ گوناح. ـــ ی: بێ سووچی، بێ گوناحی.

**بێ تەرش:** مرۆی بەدخوو و بەدڕەفتار، کە جێی باوەڕی نەبێ، مرۆی کەمتەرخەم.

**بێ تەشە** (باک.): بێ نرخ، پووچ، بێ هێز، کەوتوو، کەفتەکار. جوورە ئێستڕێکە بۆ بارکردن و سوواری ناوەستێ.

**بێ تەل:** مەکینەیەکە بە بێتەل قسەی پێ دەکرێ و وەردەگیرێ.

بێ تەل

**بێتر** (بۆتا.): پتر.

**بێ ترس:** بێباک. ـــ ی: بێباکی.

**بێ ترمە:** کانییەکە لەلای ڕۆژهەڵاتی شەقڵاوەوە لەپاڵ چیای سەفینەوە هەڵدەقوڵێ، ئەم کانییە سێ واتای هەیە: ١) بێ: وەرە، ترمە واتا مانگی تیرمە، کە تەمووزە یانی لە تەمووزێدا وەرە ئێرە. ٢) بێترمە: واتا بێ تەمووز و هاوینە و هەمیشە هەوای خۆش و فێنکە. ٣) ترمە بەکوردی دەنگە بەڕاستی لە بن بەردێکی گەورە دێتە دەرێ و هیچ دەنگی لێ نایەت و بێ دەنگە.

**بێتقاب** (باک.): بێ هێز.

**بێ تک** (باک.): چۆڵەکە.

**بێ تلشا** (باک.): پتری. وولاخ.

**بێ تۆ:** بەبێ تۆ.

**بێتوو:** ڕاست: ئەگەر بێتوو وابێ: ئەگەر ڕاست بوو وابوو. بەبێ تۆ.

**بێتووتە:** بێ ئەنوا، بێ ماڵ.

**بێتووان** (باک.): ناتووان، بێ تاو، بێ دەرەتان. ـــ ی: ناتووانی، بێ تاوی.

**بێت وبێت:** جوورە گەمەیەکی منداڵانەیە.

**بێتووتە** (باک.): وازلێ هێنراو، پشت تێکراو، هەژار، دەربەدەر، بێ پارە.

**بێتۆر** (باک.): بێکار، دەستەوەستان.

**بێتۆرە:** (باک.) بترەک، بێ شێواز، بێ ئەدەب.

**بێتووش:** گوندێکی بەناوبانگی مێژوویییە لە دۆڵی ئاڵانییە لەنزیک پردی تەیەنێ، کە لە ژێر فەرمانڕەوایی شاری قەڵادزێدایە، مەڵبەندی مەلاعەبدوڵلا و مەلامەحمود و حاجی مەلا ڕەسوولی بێتووشییە.

**بێتووک:** باریک و لاواز، ڕووت، بێ کەیف.

**بێ تێل:** لاسلکی، تەلگرافی بێ سیم. بێ تەمەل.

**بێ تین:** لاواز، بێ هێز، چلەک، (ڕۆژ.) نێرەتی. بێ زۆر. ــ ی: لاوازی، بێ هێزی، چلەکی، (ڕۆژ.) نێرەتی.

**بیج:** زۆڵ، بیژوو.

**بێج (باک.):** ڕەنگی گۆشتی.

**بێجا:** بێ جێ، نالەبار، وێڵ، پەرت.

**بیجا:** پێچە، پەچەی ژنان، ڕووبەند.

**بیجادە:** جوورە یاقووتێکی سووری نزم و کەم نرخە. جوورە زەنگیانەیەکی درێژکۆڵەیە ژنان دەیکەن بەژێر چەنە و بەچاوگە.

**بێجاکردن:** کار و یا قسەی بێ جێ کردن.

**بێجامە:** بەرگێکی تایبەتییە شەو لەبەر دەکرێ.

**بێجان:** کێوێکە لە باشووری ڕەواندزێوەیە چیای بێجان کەوتۆتە نێوانی بێجان و ڕەواندز.

**بێجایی:** بێ جێیی.

**بێجقە:** بێ نیشان، سادە.

**بێجگـە:** بەجگە، بجگە، بەبێ، جگە، بێ، بێ لە، بێژگە، بێژ، ژبل، (باک.) ژبلی، بەدەر، بەرجا، خەین، (هەو.) هێ لە، بژلەوی: بێجگە لەوی، بلێ وی.

**بێجێ:** بێ ڕێ، بێشووێن، (باک.) بەرهەوا، نادیار، پرۆز، بێ کەلک، بێ نەوا، بێ داڵدە.

**بێجێگـە:** بێجێ، بێشووێن.

**بێجێیی:** بێڕێیی، بێشووێنی، بەرهەوایی، بێ کەلکی، نادیاری، پرۆزی.

**بێچارە:** نێوی نێرینانە. ناچار، بەڵەنگاز، بەستەزمان، گەدا، قەڵەندەر، لێقەوماو، بارکەوتوو، دەستەپارچە، هەژار، داماگ، بێ بەخت. (شن.) پارچە دارێکە لەگەڵ گاسنی ڕێک دەخرێ و لەزەوی کێڵراودا بە یەکجاری جۆگەی پێ لێدەدرێ. ــ یی: لێ قەوماوی، بارکەوتوویی، هەژاری، بەستەزمانی، گەدایی، ناچاری، بەڵەنگازی، دەستەپارچەیی.

**بێ چاڤ:** بێ چاو، کووێر، کۆرە.

**بێ چاوەڕوو:** بێ شەرم. ــ ی: بێ شەرمی.

**بێ چاوێنی:** بێ چاوانی، دوور لەچاوی پیس، لەنزاکردندا بۆ یەکێک یا چتێک بەکاردێنرێ، کە چاوی پیس کاری لێ نەکا: کوردستان ــ بێ لەسەر ڕووی زەوی دەڵێی بەهەشتە.

**بێ چەک:** بەبێ چەک.

**بێ چەن و چۆن:** بەبێ پەیمان و مەرج و ڕێکەوتن.

**بێچرکە:** بێ هەست، ئارام، بێ دەنگ.

**بێچڤـان (بـاک.):** بەرخـەوان، کـارەوان. (بـاک.) ــ ی: بەرخـەوانی، کارەوانی.

**بیچک:** (فە.) بووچک، گچکە.

**بیچم:** شێوە. فێڵباز، ساختەچی.

**بێچوو:** مندا ڵی ساوا، بێچووی باڵندە و ئاژاڵان، بەچکە، بەچی، بەچە، بیچی، وەچکە، دۆل، (دەر.) بیچوولە، وەچکە. جوورە پارەیەکیش بووە.

**بێچوولە:** ساوای گیاندار، بێچوو. پارچەیەکە دەکەوێتە ئاستی نیفەکی ژنانەوە.

**بێچووەمامز:** کارمامز.

**بێچووەوان:** بەرخەوان، کارەوان، (باک.) بێچڤان.

**بێچوون:** تاک، تاق، بێ مانەند، تەک، بێ چەشن، بێ هاوتا.

**بێچی (باک.):** بێچوو، بزن و مەڕ.

**بێچیڤان:** شووان، بەرخەوان.

**بێچیک (باک.):** نازیرەک، کەودەن، گێل.

**بێحاڵ:** ماندوو، مەلەنگ، لاواز، نەخۆش، هەژار، نەخۆشی کەشەنگ، لە گیانەڵلاڵدا بوون. ــ بوون: نەخۆش و لە گیانەڵلادابوون. ــ کردن: نەخۆش و لەگیانەڵلادا خستن. ــ ی: لاوازی، نەخۆشی، هەژاری، باری گیانەڵلایی، مەلەنگی.

**بێحەد:** بێ سنوور.

**بێحێل (باک.):** بێ تین، بێ هێز.

**بیخ:** بێخ.

**بێخ (هەورا.، کە.، لو.):** بن، پەی، ڕیشەی دار و گیایانە و بە بن و ژێرەوەی هەموو چتێکی دەڵێن، دوایی. گوڵێکی جووانی کوێستانییە.

**بێخار:** بێ دڕوو، بێ دڕک.

**بێخاڵ:** نێوی مێینانە. بێ نیشانە، (باک.) باپیڤان. هاوینە هەوارێکی بێ هاوتایە، پڕژ، کەلبەز، تاوڕێژ (شلالە) یێکە سینگی چیایەکی بەرزی چەند کون تێکردووە و لە حەواوە بە لافاو، کە دێتە خوواری ڕەنگی سپی و هەمووی وەکوو کەف وایە و زۆر ساردە کەوتۆتە لای ڕۆژاوا و باشووری ڕواندزێ وە لە کلکی کۆڕەکی دێتەدەرێ.

**بێخاوەن:** بێ خوداوەند. ــ ی: : بێ خوداوەندی.

**بێخەم:** بێ پەژارە، بێ پەرۆش، ئاسوودە. ڕاست، ڕێک. ــ ی: بێ پەژارەیی، بێ پەرۆشی، ئاسوودەیی.

**بێخەو:** بێدار، وریا. ــ ی: بێداری.

**بێخ بەستن:** ڕیشەداکوتان.

**بێخ بڕ:** بنەبڕ، ڕیشەکێش، ڕیشەکەن. ــ کردن: بنەبڕکردن. ــ بوون: بنەبڕبوون.

**بێخ پەڕ:** چلی پەڕی باڵندان.

**بێخ وبنج:** ڕەگ و ڕیشە.

**بێخ جوجکە:** کلێنچک، بن جووجکە، بن دوو، بێخ دوو.

**بێخ درەخت:** ڕەگ و ڕیشەی داران.

**بێخ دیان:** پووک، پدوو، هاروو.

**بێخ دیوار:** بن دیوار، بنەڕەت، بنیاد.

**بێخ ران:** بنڕان.

**بێخمـە:** گەروێکـە زێـی پێـدا دەڕوات کەوتۆتـە لای ڕۆژاوای بـاکووری باتاسێ شووێنەکەی زۆر خۆش و دڵگرو بێخمە.

**بێخ ناخوون:** بن نینۆک، نازە، بن ناخوون.

**بێخ نیشتن:** لەبن نیشتن.

**بێخ نشین:** ــ تانشین. ــ نیشتک.

**بێخووەدی:** بێ خێوی، بێ خاوەنی.

**بێخود:** بێ هۆش، لەخۆچوو، ماندوو، مەلەنگ. ـــ ی: بێ هۆشی، لەخۆچوویی. پووچ، بێهوودە، فیڕۆ، خۆڕایی. بیابان، بیاوان.

**بێ خوست:** بێ هەست.

**بێ خوست بوون:** بێ هەست و بێ دەنگ بوون.

**بێخودی:** بێهۆشی، بیابانی، لەخۆچوون. بێ خاوەندی، بێ خێوی.

**بێخوز** (ڕۆژ.): کیسەی بێ زامبینە.

**بێخێر:** بێ کەلک، بێ سوود، بێ فەڕ، بێ سوو. ـــ ی: بێ کەڵکی، بێ سوودی، بێ فەڕی.

**بێداخ:** بەیداخ.

**بێداد:** خوێڕت، زۆردار، دوورلە دادگەری. زۆر، ستەم، جەور. زۆر، بێ ژمار، گەلێک. ـــ ی: زۆرداری، خوڕتی.

**بێدار:** بێ درەخت و بێ داروبار. وشیار، وریا، بەئاگا. ـــ بوونەوە: وشیاربوونەوە. ـــ کردنەوە: وشیارکردنەوە، نێوی پیاوانە.

**بێدارەوەکردن:** وشیارکردنەوە، وەئاگاهێنانەوە.

**بێداروماڵ:** بێ ماڵ و حاڵ، هەژاری.

**بێداری:** وشیاری، بەئاگایی، وریایی.

**بێدان:** بێ تووم.

**بێدانە:** بێدان. دەنکی بێی، دەنکی بەهێ.

**بێداوی** (باک.): بێ برانەوە، بێ بەروودوایی.

**بێدەر:** نێوی کوڕانە. بێکەس، بێنەوا، (لور.) بێ پەژمار، بێدەرەتان، بێمەڵوەن، بێمەڵوەند. کاتی هەوەڵ پێگەیشتنی بەرهەمانە، (هەو.) بەیدەر، (باد.) جۆخینی گچکەیە.

**بێدەرەتان:** بێدەر، بێجێ و ڕێ، بێکەس، بێنەوا.

**بێدەری:** بێ نەوایی.

**بێدەسی:** بێدەست.

**بێدەست:** دەستکورت، نەدارا. دەست براو. ـــ ی: هەژاری، دەستکورتی. ـــ ی: هەژاری، دەست کورتی. بێ دەستێتی.

**بێدەسنوێژ:** کەسێکە دەستنوێژی هەڵنەگرتبێ یا دەسنوێژی شکابێ. ـــ ی: بێ دەستنوێژی.

**بێدەق** (ڕۆژ.): ڕەنگ پرووکاو، دەق شکاو، هەژار، ئەو کەسەیە لەسەر باری خۆی نەمابێ.

**بێدەم:** بێ کات. بێ دەم و پل، قسە نارەوان.

**بێدەم و پل:** بێدەم، کەمدوو.

**بێدەم و پلی:** قسە نارەوانی.

**بێ دەم و دووان:** بێ دەم و پل، کەمدوو.

**بێدەمی:** بێ دەم و پلی.

**بێ دەنگ:** کپ، مات و خامۆش، بێ قسە. ـــ بوون: خامۆش بوون، وەڵام نەدانەوە، ئەو دەنگانەیە لەناو ئەلف و بێی کوردیدا کە دەنگی لێ نایەت.

**بێ دەنگ بوون:** مات و کپ و خامۆش بوون.

**بێ دەنگ کردن:** مات و کپ و خامۆشکردن.

**بێ دەنگی:** کپی، ماتی، کش و ماتی، نارامی.

**بێدل** (باک.): غەمگین.

**بێدڵ:** نێوی پیاوانە. بێ جەرگ، بێ زاوور، ترسەنۆک. کەسێکە هەوەسی بە دڵداریتی نەیەت، دڵمردوو. ـــ ی: ترسەنۆکی.

**بێدوو** (باک.): بێ دووکەڵ.

**بێدووا:** بێ پایان. ـــ یی: بێ پایانی.

**بێدوور** (باک.): بەڕێز، بەهێز، هێزرا.

**بێدۆش** (باک.): سەتڵ هی داربێ یا ئیتر بۆ شیر تێدا دۆشینێ، گادۆش.

**بێدوندان:** بێ دوایی، شوێن براو، بێ منداڵ، ووجاخ کوێر، نەزۆک.

**بێدوندە:** کەسێکە دووای مردنی هیچ منداڵی لە پاش بەجێ نەمابێ، کۆردوندە، وەجاخ کوێر.

**بێ دیان:** بێ ددان.

**بیر:** چاڵاو، دەڤی، قۆلیت. یاد، ڕەت، ویر، هزر، هویر، بیراهی، جێل، هووار، هۆشی (ئاقڵ)، لە ـــ بوون: لەیادبوون، لەبیرچوون: لەیادکردن، هزرکرن، فەرامۆشکردن، بیربلاو: ڕەتبلاو، لە ـــ کردن: ژ دل ئاڤێتن.

**بێر** (ڕەوا.، خۆ.): بیل. دارێکە ڕاست و چەپ دەچەقێنرێ یەکێک لەسەری دادەنیشێ یەکە یەکە سەری ئاژاڵانی دۆشەنی دەگری بۆئەوەی بێری بیدۆشێ، شوێنی ئاژاڵ لێ دۆشین، دۆرەمەڕ، (دەر.) بێرە. (باک.) بێرکم، تووله، بێڵ، وان، کات، چاخی ئاژاڵ و پاشین، یەکبێر. دووبێر: یەکدان دوودان، مەرلەبێردان، ڕانووانن.

**بیرا:** بێنە، بێرانە، بهێنە. بە بیر، بە زەین.

**بێ ڕا:** بێ ڕەووشت، بێ ئایین، بێ ڕێواز.

**بیراز:** وەرەنیا، (هەو.) بەرەنیا، (هەورا.) میراس، چاک کردنەوە، ـــ ی ئاشی. ـــ کردن: ڕەقاندن، قەیارەکردن، زیرکردنەوەی دیوی ناوەوەی بەرداش و دەستاڕ دووای سووانی کەل و کونگرتنی دیواری ووشکە کەڵەک، دیوارکردنی نەملا و لای کاریز و گۆڕ بە ووشکە کەڵەک، لێدانی زۆر.

**بیرازتن:** چاک کردنەوە. گۆڕ و بیرو چاڵ هەڵکەندن بە ڕێک و پێکی.

**بیراق** (باک.): ئاڵا.

**بیرانە:** بێنە، بیران، بهێنە.

**بیراو:** چاڵاو.

**بیراهی** (باک.): یاد، بیر.

**بیرایی:** هەیوان، بێلایی.

**بیرە** (هەورا.): بیر.

**بیرەبیرە:** کەمکەمە، یەک یەکە، وارەوارە.

**بێرە:** بێنە، بێرانە، باوەرە، باوره. وەرە. هاتنەوەی ئاژاڵانە لەنیوە ڕۆیاندا بۆ دۆشین، کۆکردنەوەی ئاژاڵانە لەنیوەڕۆ و ئێوارandا بۆ دۆشین.

**بێرەخەو:** خەوێکە دەستی پێکردبێ و هێشتا هۆشیشی مابێ، خلماش، لەخەوڕاچوون، (هەورا.) وەنەوزەکوت، لەبێرەخەودا: خەوماشبوون

**بێرەدا:** بەنێرەدا، واوە، پێگەنە، ویڤە، هێڤە، ڤێڕا.

**بێ ڕەزا:** ڕەزاگران، ناشیرین، ڕەزاتاڵ. زۆردار، زیاندەر، بێ ئامان.

**بێرەڤان** (باد.): یادگار، بیرەوەری.

**بێ ڕەنگی:** بێ چوونی.

**بێرەوە** (ئەردە.): وەرەوە.

**بیرەوە:** بیرەوەری.

**بیرەوەخەر:** هۆشێنەوە، وەبیرخەر، وەیادخەرەوە.

**بیرەوەر:** بەهۆش، هۆشدار، تێگەیشتوو. ــ ی: هۆشداری، تێگەیشتن، یاد، ماوەی بیرکردنەوە، ماوەی یادکردنەوە، هێزێکە لە مێشکدا، کە چاکەو خراپە لێک جوێ کاتەوە.

**بیرەوەکردن:** بیرکردنەوە.

**بیرەبڕ** (باک.): تێگەیشتوو، بەهۆش، هۆشدار، زیرەک، زرنگ، خاوەند دڵ و دەروون، بەوجدان.

**بیرتیژ:** تیژبیر.

**بیرچوون:** چت لەیاد دەرچوون لە دەمێکیدا، لە بیرچوون، فەرامۆشکردن.

**بیرچوونەوە:** دەرچوونی چت لەیاد بەئێگجاری.

**بیرخستن:** خستنەیاد.

**بیرخستنەوە:** خستنەوە یادی چتێک بۆ یەکێک.

**بیردۆز:** بیرو باوەڕ. ــ ی: بیروباوەڕ.

**بیردۆش:** (بۆتا.) زەرک، گادۆشە، مانگادۆشە، سەتڵ.

**بیرزان** (باک.): گیایی، ڕووەکی.

**بیرزانی:** بڕوانە: بیرزان.

**بیرقووڵ:** بیرفرەقووڵ. ــ ی: بیرفراوانی.

**بێرک** (باک.): بێڵی بەفرو زبڵییە.

**بیرکەر** (باک.): بیرهەڵکەن. (باد.) جۆلا. لەبیربەر، لەیادبەر. (باک.) ــ ی: بیرهەڵکەندن. لەبیرکردن، لەیادبردن، فەرامۆشکردن.

**بیرکەفتن:** یادکەوتن.

**بیرکەوتن:** بیرکەفتن.

**بیرکەوتنەوە:** هاتنەوەیاد.

**بیرکەهی** (باک.): جوورە بووزوورێکە.

**بیرکردن:** یادی کەسێ یا چتێک کردن.

**بیرکردنەوە:** ووردبوونەوە بەدڵ لە چتێک.

**بێرکەم:** (بار.) توولە، (باک.) ڕکە، بێز، ڕەکک، قەغەز.

**بیرکۆلا** (باک.): بیرهەڵکەن.

**بیرگا:** یادگە، یادگا، بیرگە.

**بیرگە:** بیرگا.

**بێرگ:** بێر، شوێنێکی تایبەتییە ئاژاڵی تێدا دەدۆشرێ. خاکەنازی دەم پان و گەورەیە.

**بێرم** (بار.، باک.): زرێچەیێکی قووڵ و بێ بنە، کە نە ئاوی بۆبچێ و نە لەبەری بڕوات، (ڕەوا.، خۆ.) بیرمە. (باک.) حەوز. لیتەی بن ئاوی.

**بیرمە:** بێرم.

**بیرمشک:** ڕجن، دارێکە وە دارە بی دەچێ ئارەقی گوڵە بۆنخۆشەکانی دەگیرێ وە لەویش شەربەتی دروست دەکەن.

**بیرمکە:** چیایەکە لەنێوانی ناودەشت و شاوڕێدایە چەند چاڵێکی پڕ لە ئاو و گەلێک چاڵی بێ بنی تێدایە. کە قووڵی تەخمین ناکرێ بەردی تێ باوێی تا کاتژمێرێکی هەر دەنگی لێوەدێ.

**بیرمۆک** (گەر.): (کۆ.) بنەوشۆک، (بار.) بەنەشیشۆک، قەزوانی وورده، بەداروبەرەکەشی دەڵێن: بیرمۆک.

**بیرمیشک:** بیرمشک.

**بیرنامە:** پەڕاوییە، کە چتی تێدا بنووسرێ بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا وەیادت بێنێتەوە، یادنامە.

**بێڕوو:** شەرمن، شەرمێوون، شەرمەزار، فەهێتکار، کەمڕوو، بێ شەرم.

**بێرۆ:** جوورە نەخۆشییێکی پێستی مرۆیە و دوو چەشنە: ــ ی تەڕ و ــ ی ووشک، خارشت، خورش، خورشت، (هەورا.) والاًمەنی، (زەن.) گەزەنەک، (کە.) گەزەنە، (ڕۆژ.) پیزۆک.

**بیرۆبەرتک** (ڕەوا.): خەنەگورگە.

**بێرووت:** پایتەختی لوبنانییە (١٠٠٠٠) کوردی تێدایە. ڕۆژانوو، ستێر دوو ڕۆژنامەی کوردی بوون لەوێ بە تیپی لاتینی دەردەچوون لەلایەن زانای ناودار دۆکتور کامەرانەوە.

**بێرووەرد:** پیتۆڵ. ــ ی: پیتۆڵی.

**بێرۆڤ:** گیایی. خونچە. دورمەڵ، قوونێر، تووکی بەری مرۆڤان.

**بێرووک** (باک.): گیرفان.

**بێڕوومەت** (باک.): بێ نرخ، بێ قەدر، بی ئابڕوو.

**بێروون** (شار.): چۆلگەیەکە ئاوی بۆشینایی و بۆ خوواردنەوە لێ چنگ نەکەوی. ــ ی: دیوەخانە.

**بیرهاتن:** لە یادبوونی چتێکی کۆن.

**بیرهاتنەوە:** وەیادکەوتنەوە.

**بیرهاتی** (باک.): یادگار.

**بیرهەڵقەندن:** چاڵاوهەڵکەندن.

**بێ ڕێ** (کۆ.): گیایەکە لە لاسکی تووتنێ دەری دەکا و لەناوی دەبا، (موک.) کیرکەڵەگا، کار و ڕەفتاری بێ جێ و ناپەسند. بێ جێ، بێ شوێن، لاڕێ.

**بێری** (باک.): جێگای ئاژاڵ لێ دۆشینێ. کابانێکە ئاژاڵان بدۆشێ، (باک.) بێریڤان. گیرفان.

**بێ ڕیش:** لووسکە، بێ تووک.

**بێریی:** بار و جوولانێکە لەکاتی منداڵبوونێدا بە ئافرەتان ویا بە ئاژاڵانی ناووسەوە دەبینرێ، (باک.) بیرین.

**بیرمیشکی پڵاوی:** ڕجن.

**بێریڤان** (باک.): بێری، ئاژاڵدۆش. پیاوی دەشتەکی.

**بێریک** (هەڤێ.): گیرفان.

**بێری کرن:** بێرێتی کردن، ئاژاڵ دۆشین.

**بێ ڕێگە:** هەڵەت.

**بێرین** (باک.): بێری.

**بێز:** نیشتیا، قێز، قیل، مگێز، قیز. ــ هاتن. ــ نەهاتن. ــ کردن: دڵهەڵشیوان لە چتێک، ــ کردنەوە: دڵهەڵشیوان لە چتێک. ــ بوونەوە:

قێزەوون. بلووری، مەرمەڕشا. ڕەنگ: بەهەشت هەر وە بێزی کوردستان دەچێت. سینگ، سینە.

**بیزا:** گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانییە و لەنێو شیرێژی دەکرێت، بەیزا، لەترشیاتی دەکرێت.

**بێ زات:** ترسەنۆک، بێ زاوور، کەمدڵ.

**بێزار:** نێوی نێرینانە. تەنگاو، کەوەڕێ، وێزار، وەڕەس، وەڕەز، جاڕس، (هەو.) هەراسان، (کە.) لۆس. ـــ بوون: هەراسان بوون، وەڕەزبوون، کەوەڕێ بوون. ـــ کردن: هەراسان کردن، وەرەزکردن. بێ دەم، بێ دەو، کەوەڕێ کردن.

**بێزاری:** هەراسانی، وەڕەزی.

**بێزاریێ:** ناوی ئافرەتانە.

**بێزاڵە:** ترسەنۆک.

**بێزان:** (زەن.) بێزوبۆکردن، بێزکردن، (ڕەوا.) لەبەرچاوکەوتن، وەڕەزبوون.

**بێزە** (ڕۆژ.): بێزوو. مەگیرانی. جوورە دراوێکی بێ نرخە.

**بێزەر** (باک.): زەردەبی، یەکێکە لە چووار جوورەکانی دارەبی.

**بێزەڕوو** (ڕەوا.): (مەها.) جەحفەری، (بار.) ڕیشاڵۆ، گووزەڵە، گیایەکە وەکوو کەرەووز وایە گەڵای وورد و توونی ئارییە دەخورێ.

**بێزەوەر** (هەو.): ڕزیو، هەڵوەریو، پیس، ناهەموار، ناڕێک، چڵکن، هەژار، بێ دەستەڵات. ـــ ی: وەڕسی.

**بێزراڤ** (باک.): ترسەنۆک. (باک.) ـــ ی: ترسەنۆکی.

**بێزران** (هەررا.): لەبەرچاوکەوتن، بێزلێ کران.

**بێزرو:** لەبەرچاوکەوتوو.

**بێزکار:** جنێودەر. (خۆ.) ـــ ی: جنێو، سووک و ڕیسواکردن.

**بێزکێ:** حەسەنی بێزیکێ شایەرێکی کوردە لە چیای مازێیە لە باکووری کوردستان.

**بێزگ:** بێزوو، مەگیرانی، مژن.

**بێزگەوان:** ژنێکە مەگیرانی بکات، مژنەوان.

**بێ زمان:** کپ، خامۆش. لاڵ. ـــ ی: کپی، لاڵی.

**بێزنەهاتن:** دڵ هەڵنەگرتن.

**بێزوو:** (شار.، بابا.) مەگیرانی، هەوەس. (دەر.) بیزی، (هەو.) مگێز، (هەر.) بیزا، گیایەکە لە نێو شیرێژی دەکرێ. ـــ کردن: مەگیرانی کردن.

**بیزۆب:** میکرۆبێکە ببینرێ، چیرە، زۆر دار.

**بێزوبۆ:** پووشڵ، موونج، جاڕس. ـــ کردن: بێزان، بێزیان.

بێزوبۆکار: بێزیاو.

بێزوبۆکاری: بێزیاوی.

بێزوبۆکردن: بێزوبۆ.

**بێزووکار:** مەگیرانی کار.

**بێزهاتن:** دڵ هەڵگرتن، بۆ خواردن و بە تەوسەوە بۆ قسەکردنیش بەکاردێ.

**بێزێ:** ناوی ئافرەتانە.

**بێزی** (باک.): پەریشان، بێزوو.

**بیزی** (هەورا.، دەر.): مەگیرانی. (باک.) ڕەنگی پەنبەیی.

**بێزیاگ:** بێزراو، بێزو بۆلێ کراو.

**بێزیان:** بێزران، تکان.

**بێزیاو:** بێزوبۆکەر.

**بێژ:** بێژندە، بێژەر. بەڵان بەتەنێ بەکارنابرێ بخرێتە دووای هەر ووشەیێکییەوە دەیکاتە بکەر وەکوو: گۆرانی بێژ، چیرۆکبێژ. بێجگە، جگە، بێلە.

**بێژاربێژار:** چتی ڕزیو و کونکونی هەلابەهەلا.

**بێژان:** کوتن، ووتن. دابێژتن. (موک.) بووژان، گیایەکە بیکوتن و بیکوشن ئاوەکەی بۆ برینی ماڵاتان زۆر بە سوودە و کرمی دەکوژێ، ئەم گیایە لە هەر ژوورێکیش دانرێ لەبەر بۆنەکەی مێش و مێشوولەی لێ نامێنێ، دەشی کەن بە گزرە بۆ ئاژاڵان. دووان، وێرانکردن: هەر چی بوو بە ئاغامان، کوردستانیان بێژا: وێران و کاوولکرد.

**بێژانە:** بۆژانە.

**بێژاندن:** بێژانەوە، کوتنی چت. دابێژتن.

**بێژانن:** بێژاندن، لەبێژنگ دان.

**بێژە:** بڵێ، بووێژە.

**بێژەر:** بێژندە، ئەو کەسەیە داخوێ.

**بێژەک:** گیانداری کەم شیر لەپاش زانی. گرامافۆن.

**بێژەن:** ناوی پیاوانە، (هەورا.) بێ ژن.

**بێژبیرەڕەش** (باک.): گەنمێکە گوڵی ڕەشبێ.

**بێژتن:** کوتن، ووتن، (هەورا.) واتەی. دابێژتن.

**بێژگە:** (ڕەوا.) بێجگە.

**بێژڵک** (باک.): بیژوو.

**بیژمۆتە** (باڵە.): بیژوو.

**بێژن:** سەرەند، بێژنگ. بڵێن، ببێژن، بۆ گەلی دووەم و سێیەمە: ئێوە بێژن، ئەوان بێژن، دەنگی جووڵەی چت، سەرەند، (سوور.) بێ ژن، پیاوێکە ژنی نەبێ، (باد.) بێوەژن.

**بێژندە:** بێژ، بێژەر، ئەوکەسەیە دەدوێ.

**بێژنگ:** مرازێکە دەغل و دانی پێ دادەبێژرێ لەسەرەد و شێلگیری کونی گچکەترە، (هەورا.) وێچنە، ویژنگ.

**بێژنگەر:** بێژنگساز، بێژنگ دروستکار.

**بێژنی:** قازاخی، بێوەمێردی.

**بێژوو:** ژنی کەم شیر.

**بیژوو:** بیژیلەک، (باک.) پینج، (بابا.) زۆڵ، بیژمۆتە، شەلووف، بیژی، بیژک، (باک.) بیژلک، توخمەتەخێڵ، توخمەحیز.

**بێژۆک:** جێگایەکە بۆ ئاخەفتنی لێ کۆببنەوە. چەنەباز.

**بیژۆک:** دەنکە ڕەقەکانی نیسک یا نۆک یا ماشیە، کە ناکوڵێن. بەو پارچە ڕەقانەش دەڵێن، کە لە نێو بەرووددا هەڵدەکەون و وەکوو ئێسکی وان. (باد.) بزن یا مەڕێکە، کە بەگیسکی و کاوڕی ئاووس بن و بزێن.

**بیژۆیتی:** (باک.) بیژێتی.

**بیژیی** (باد.): زۆڵ، بیژوو.

**بیژیتی** (باک.): بیژوێتی.

**بیژیلەک** (باک.): بیژوو.

**بیس**: بیست (٢٠).

**بێسام**: بێ ترس.

**بێسامان**: بێ دەوڵەت، ڕەجاڵ، ڕیپاڵ. چتی زۆر. بێ ڕێ و جێ، بێ یاسا، نارێک. ـــ ی: بێ دەوڵەتی، ڕەجاڵی، ڕیپاڵی.

**بیسان**: بێستان.

**بێسانەوان**: بێستانەوان.

**بێسە**: بووێسە، ڕاوەستە، سینگت فراوان بێ، پشووت درێژبێ.

**بێ سەر** (باک.، موک.): بێ ڕێ و جێ. ـــ و بەر: بێ ڕێ و جێ، بێ شوێن، بزر، وون، وێڵ.

**بێ سەرە**: بێ خاوەند.

**بێ سەرەتا**: بێ بەرایی، هەمیشە. ـــ یی: هەمیشەیی.

**بێ سەروبەر**: نارێک، ئاڵۆز، شلێخە. ـــ ی: نارێکی، ئاڵۆزی.

**بێ سەروبن**: هەمیشە. هیچ و پووچ، بێ مەغز، نارێک، تێکەڵ و پێکەڵ. ـــ ی: هیچ و پووچی، بێ مەغزی.

**بێ سەروپا**: بێ سەروپێ، نارێک، ئەلۆجەلۆ، نزم، نابووت. ـــ یی: بێ سەروپێیی، نارێکی، نزمی، نابووتی.

**بێ سەروپێ**: بێ سەروبن. ـــ یی: بێ سەروبنی.

**بێ سەروتا**: بێ سەروپا.

**بێ سەلا**: بێ کەس، کەسێکە هاوار و بانگی بەکەس ڕانەگات.

**بێ سەواد**: نەخوێندەوار، نەخوەنە. ـــ ی: نەخوێندەواری.

**بیست**: (٢٠)، بیس، ڤیس، (زا.) بیست. تاو، دەم، بیستێک: تاوێکی، دەمێکی، بیستەک: تاوێکی، دەمێکی.

**بێستان**: (هەمە.، دەر.) بۆستان، (هەورا.) بۆیسان، (باک.) بیستان، کشت و کیاز، مەختی، مختی، مخمخک، سەوزیخانەیەکە کاڵەک و شووتی و خەیار و ترێزو و سەوزەواتی لێ بەرهەم دێنرێ.

**بێستانەوان**: بێستانچی، بۆیسانەوان. ـــ ی: بێستانچێتی، بۆیسانەوانی.

**بێستانجاڕ** (خۆ.): زەوییێکە تووتنی لێ بچەقێنرێ، بێستان یا شینایێکە بەراو بێ.

**بێستە**: بوەستە، ڕاوەستە.

**بیستەر**: بهستۆک، (باک.) بهستیار، بیستەک، گوێگر، گوێ ڕاگر.

**بیستەک**: ڕادیۆ، گوێگر، بیستۆک، گوێ ڕاگر.

**بیستەم**: چتێکە لەپلەی بیستەمدا بێ.

**بیستەمین**: بیستەم.

**بیسترو**: ئەوەی کەوتۆتە بەر گوێ.

**بیستن**: (هەورا.) ژنیەی، شنەفتەی، (باک.) بهیستن. شنەفتن، ژنەفتن، شنەوتن، (زمن.، فە.، دەر.، هەورا.) ژنیەن، ئەژنەفتن.

**بیستنەوە**: بەگوێ گەیشتنەوە، دووبارە شنەفتنی قسەیەک، کە لە هەر بارەیەکەوە کرابێ.

**بیستۆک**: گوێ ڕاگر، بیستەک، تەلەفۆن.

**بێستوون**: بێ ئەستوندە، بێ کۆڵەکە، ئاواییێکی کۆن و بڵندە لە قەسری شیرین.

**بیست و یەکەڵەی گۆرانی** (هەورا.): ٢١ی مانگی نێوەڕاستی زستانییە و ئەوانەی لەسەر کوتراوە: کەری بردە سەرکانی کورتانی هێناوە بە شانی. بیست و یەکەڵەی گۆرانی ئەگەر بەفرنەکەوێ، تا قوڵتەی ڕانی، گۆران لە هیچ نەزانی.

**بیستیک** (باک.): بستەی سەر تەندووریێ، شیشەی کورت.

**بێسکار** (خۆ.): جنێو فرۆش، ئازاردەر، سزاکار. (خۆ.) ـــ ی: جنێو، سزا، ئازار، بیسکانی.

**بیسکانی** (باک.): جنێو، سزا، ئازار، بیسکاری.

**بێسوا** (موک.، باک.): بێ گومان، بێ دڵاو دڵی (بێ شک). (باک.) بۆسۆ. مەکۆیەکە خۆی تێدا حاشار دەدرێ.

**بێ سووچ**: بێ تاوان. ـــ ی: بێ تاوانی.

**بێ سۆز** (باک.): بێ بەخت، بێ پەیمان، پەیمان شکێن.

**بێسووس** (باک.): مۆمدان، شەمدان.

**بێسی** (باد.): ماستێکە تامی تێکچووبێ.

**بێسیرە** (باک.): قۆرە، پەسیرە، بەرسیلە.

**بێسیم**: بێ تێل، تەلگرافی بێ سیم، بێ تەل.

**بێش** (باد.): باربوو، بەش. ـــ کردن: بەشکردن. بلێ. (باک.) باج، خەراج، بەش.

**بێشە**: مێشە، چەم، (هەورا.) وێشە، کوواشە. دارستانی چڕ، دارسان.

**بیشە** (هەو.): باربوو، کۆمەگی. (شەبە.، ڕۆژ.) دانیشە، (هەورا.) بنیشەرە.

**بێشەمر**: ناشتی خوواز.

**بێ شەرم**: بێ ئابڕوو، ڕووقایم، بێ ئاوڕوو، کاوڵی، ڕووش، قوڵتەش، کوڵەش، (باک.) بێ فەهیت، داشۆریاگ. ـــ ی: ڕووقایمی، بێ فەهیتی، بێ ئابڕوویی.

**بێشەلان**: جەنگەڵ، دارستان، لێڕ، لێڕەوار، بێشە، بێسەچخوڕ، شەخەڵ.

**بێشەنگ** (باک.): گرینۆک، ئەوکەسەیە زۆر بگری.

**بێ شک**: بێشکە، لانک، گاوارە. بێ سوو.

**بێشکە** (بابا.): لانک.

**بێ شۆ** (ئەردە.): بێ شومار.

**بێ شوو**: بێ ژمار، بێ شمار، بێداد، بێسامان. بێوەژن، بێ مێرد.

**بێ شومار**: چتی زۆر و زەبەند.

**بێ شوێن**: بێ ڕێ، نادیار، بێ جێ. ـــ ی: بێ جێیی.

**بێشیر**: کەم شیر، بێژەک، بیژۆک.

**بێشیری**: کەم شیریی.

**بێشی**: مێشە، بێشە.

**بێ شێل** (باک.): نارێک، ناجوان، ناپوخت.

**بێ عار**: کەسێکە لە هیچ چتێک پەند وەرنەگرێت. ـــ ی: پەند وەرنەگرتن.

**بێ فەڕ** (هەورا.): بەدفەڕ، ناپیرۆز، بەدوودم، شووم، بێ کەڵک. (هەورا.) ـــ ی: بەدفەڕی، ناپیرۆزی، بەدوودمی، شوومی.

**بێ فەرمان**: بێ کار. ـــ ی: بێ کاری.

**بێ فەهێت** (باک.): بێ شەرم، بێ ئابڕوو، ڕووقایم. (باک.) ـــ ی: بێ شەرمی، بێ ئابڕوویی، ڕووقایمی، ناشایانی.

**بێ فرشک** (باک.): ناپایەدار.

**بیفل** (باک.): کەپۆ، لووت، دفن.

**بێڤارج**: چتێکە بیر و عەقڵ نەیگرێ.

**بێڤان** (باک.): کابرا، هەرامە، وانێک، هێن.

**بێڤەری** (باد.): ناهومێدی.

**بێڤر**: بیوور، تەوور.

**بیڤل** (باک.): کەپۆ، لووت، دفن.

**بێڤێری** (باک.): نائومێدی.

**بێقام** (باک.): قووڵ، جێ یا گۆمێکە، کە لە بەژنێک قووڵتربێ.

**بێ قرام** (باک.): بێکەس، بێ خاوەند.

**بێقووت**: بێ زاد.

**بێ قوون** (باک.): بێ بنچینە و بێ ڕەچەڵەکە.

**بیک** (باک.): دارە.

**بیکار** (باک.): ڕەندە.

**بێکار**: بێ فەرمان، بێ ئیش، (باک.) ئەوارە، گردەنشین، چرۆت، ورلوول، پالووتە، دەستەپارچە، (هەورا.) بێ هەرمان. بێ فەرمانی، چرۆتی، پشووودان، بێ ئیشی، بێ کەڵکی، خاوی.

**بێکارە**: هیمی، تەمبەڵ، کەپەر، سست، شلەپەتە، بێ دەستەڵات، خاو، تەپڵەتر، دەستەوەستان، لەکەتە، لەکارت، بێ کەڵک.

**بێکەس**: بێ پاڵ، بێ پەنا، قەڵەندەر، بێدەر. هەستیارێکی بەرزی نیشتمان پەرستی کوردی سلێمانی بووە ناوی (فائق)ە. نێوی کوڕانە. ـــ ی: بێ خزم و کەس و کاری.

**بێکەیس** (باک.): چتێکی بە پێی ڕەوووشت و یاسا نەبێ.

**بێ کەیف**: خەمگین، خەمین، پەشێو، خەمبار.

**بیکمار**(باد.): مارمێلکە، مارمیلکۆک.

**بیک نەفسۆک** (ئاک.): باڵندەیێکی گچکەیە پشتی شینەو بن زگی زەردە، گەردن و سینگی بۆرە لەنێو دڕک و دالاّندا دەژی.

**بێ کنج**: ڕووت، بێ جل وبەرگ.

**بێکۆڵ**: جوورە دارە بیبەکە.

**بیکوڵ** (بابا.): ئەو دارە بیبە کورت و گچکانەیە، کە لە لێواری چۆم و جۆگاندا دەڕوێن و لە خۆیانەوە ڕووابن، (هەورا.) وی کوڵ.

**بێکول** (باک.): بێ دەرد، بەخۆشی، بێ دەردەسەری، بە ئاسوودەیی.

**بێکێر** (باک.): بێ کەڵک، بێ سوود.

**بێکێس** (باک.): نارێک، ناساز، نەگونجاو، بێ جێ. ـــ ی: نارێکی، ناسازی.

**بێگ**: بەگ. پیادەی شەترەنجێیە.

**بیگ** (باک.، باد.): جوورە تەڕەبێکە دەخورێ، گیایەکە وەکوو ڕازیانە وایە بەڵاّن کورتترە.

**بێگار**: سۆخرە، فەزحە، (باک.) جزار. کارێکە بە زۆرداری بەکەسێکی بکرێت بە بێ ماف و کاڵەدرانە و پارە، زۆر و ستەم. ـــ چی: کەسێکە بە بێگار کاری پێ بکەن. ـــ ی: بێگارکردن بە خەڵک، کارێکە بە بێگار بە خەڵکی بکرێ.

**بێگاڤی** (باک.): (جا.) زۆر بایی. بەزۆرەملی. بێ کاتی. ناچاری.

**بێگانە**: بیانی، تاچیک، تاجیک، هاڤی، کەسێکە، کە خزم و خووێشت نەبێ و یا لە نەتەوەی تۆ نەبێ.

**بێگانەبەدەر**: کاروبارێک لەناو خۆدا خۆبەخۆیی ئەنجامدان بە پەنهانی بەو مەرجە بێگانەیان لەناودا نەبێ.

**بێگانەپەرست**: کەسێکە حەز لە ڕاژەو پێشکەوتنی بێگانان بکات و دژی خزم و خووێش و نەتەوەی خۆی بێ. ـــ ی: حەز لە بێگانە کردن و دژی خزم و کەس و کارو نەتەوەی خۆبوون.

**بێگانەیەتی**: نامۆیی. ـــ لێکردن: نامۆیی لێ کردن.

**بێگانەیی**: بیانێتی.

**بێگەڤی** (باک.): ئازایی، زاتداری. گەوجی، ڕاڕایی.

**بێگەن**: بۆگەن، بۆن ناخۆش.

**بێگرێ**: ڕاست، پوخت.

**بێ گۆش** (هەورا.): بێگووێ. ـــ ی: بێگووێیی.

**بێ گۆڵتە** (ڕۆژ.): بێ پاڵەوانە، بێ پشتکۆڵە، دیوارێکە دار و چتی وەبەر نەدرابێ لە ترسی ڕووخان و ڕمانی.

**بێگومان**: بێ سوو. ـــ ی: بێ سوویی.

**بێگونەح**: بێ تاوان، پاک.

**بێگووێ**: لاسار، فەرمان نەبەر، سەرکێش، کەڵلەڕەق، بێ گۆش، گۆش نەگیر. بێگووێ، کەڕ، بێگۆش. ـــ یی: لاساری، سەرکێشی، کەڵلەڕەقی. کەڕی.

**بێڵ**: بێڵی بەفرماڵینێ، کە لە دار دروست دەکرێ، (باک.) بەرفی ماڵک، پاخێڵ، پاڕۆ، (ڕۆژ.) پارژۆ، بێڵی ئاسن، خاکەناز، خاک ئەنداز، (ڕەوا.) خاکەنداز، دۆلەمەڕ، (شکا.) بێرک، (شکا.، باک.، خۆ.) بێر، ئەسپار، ئەسپەر.

**بیل** (هەورا.): مەڕمەڕ، کەللا.

**بێلا** (باد.): باڵەخانە.

**بێلاسن** (هەو.): (کۆ.) ئەستیو.

**بێلانە**: بێ نەوا، بێ داڵدە.

**بێلاّیی** (کۆ.): دالاّن، هەیوان، ئەیوان.

**بێڵە**: بێجگە، جگە، بێژ.

**بێ لەبت**: پایەدار، نەگۆڕ.

**بێڵەدارینە**: بێڵ، بێلۆچکە، کە دم و کلکەکەی دارن.

**بێڵەقان** (کە.): پیشکی گیاهەڵکەندنێ.

**بێڵەکان** (دەر.): پیشکی گیاهەڵکەندنێ.

**بێڵەکەرە** (هەورا.): شەوگەرد، سول سوڵە، جوورە دووپشکێکی زۆر بچووکە.

**بێ لەنج** (موک.): خووێن گەرم.

**بێ لەنجی**: خووێن گەرمی.

**بێ لەوار**: مەحاڵێکی گەورەیە لە خاکی ئەردەڵانێدا.

**بێڵەهەر** (موک.): گیایەکی گەڵاپانە گوڵی ووردو زەردە، گوڵەکەی بێ پەرە تەنها گۆیکەی وورد و بڵاوە، دەکرێتە گزرە بۆ ئاژاڵان.

**بێڵەهەر** (ئەردە.): گیایەکی تاڵە.

**بێلبیلە**: بیبیلە، بەبەڵەی چاو.

**بێڵ تەپکردن**: کێڵانی بنی دار و درەختانە لە بەهاراندا.

**بێڵتەکردن**: کوزمالّی بن دار و کێلانی، شێکردنەوەی بنی دار و درەختان.

**بێڵچە**: بێڵی گچکە.

**بێلشا** (باک.): لاوی بێ مێشک، گەنجی گێل و گەوج و هێڕ.

**بێلکار**: کەسێکە بە بێلی کار بکات، بێلۆچکە. ـــ ی: بەبێڵ کارکردن.

**بێلکە** (هەو.): (موک.) کەفە.

**بێلندانە**(موک.): واتا بێلمان دانا، بەهاری کوردی کرماشانییە، جێژنێکی نەتەوایەتی کوردانە کە لە (٤٥)ی زستانێدا دەکرێ.

**بێلۆ** (ئەردە.): سەرچاوەییێکە لە بەهاراندا بژێتەوە.

**بێلوو** (هەورا.): کانییەکە بەهاران بژیەتەوە، کووێرەکانی، بەهارەکانی.

**بێلۆتە**: داوەت و کۆڤەندێکە فەقێ و سوختان دەیکەن و تێدا هەڵدەپەڕن.

**بێلۆچکە**: بێڵێکی دارینی کلک کورتە ناردی پێ لە دەفر و یا جەوالّی دەکرێت.

**بێلوور** (باک.): کلۆ، کولۆ، کریست، بلوور. (باک.) ـــ ی: کلۆیی، کۆلۆیی، بلووری.

**بێلووژە** (باک.): جوورە هەرمێیەکە.

**بێلوک** (باک.): بەبێ لوقەلوق، ڕۆیشتن بەبێ گورگە لۆقە.

**بێلۆکە**: بێڵی چکۆڵە.

**بێلیتە** (باک.): جوورە هەڵپەڕینێکی کوردییە بە دەم گۆرانییەوە. سروود، گۆرانی قوتابخانە.

**بێلیتەڤان** (باک.): هەڵپەڕ، سروودبێژ.

**بێلیتڤان** (باک.): هەڵپەڕ، کەسێکە سەمایە بکات و گۆرانیش بڵێ.

**بیم**: ترس، سام، پەروا، باک، بووم؛ (هەورا.) چەنی باوکت بیم: لەلای باوکت بووم.

**بیمل** (باک.): بەدخوو، ڕووگرژ. (باک.) ـــ ی: بەدخوویی.

**بێمار** (باک.): بێ مارەیی، قەپاتمە.

**بیمار**: نەخۆش، ناساز، ناساخ، نەساغ. نێوی کورانە.

**بیمارپەرس**: نەخۆشەوان. ـــ ی: بیمارەوانی، نەخۆشەوانی.

**بیمارسان**: بیمارستان، نەخۆشخانە.

**بیمارستان**: بیمارسان، نەخۆشخانە.

**بیماری**: نەخۆشی، ناساخی، ناسازی، نەساخی.

**بێ ماف**: بەبێ مز، بەبێ کاڵەدرانە.

**بێ ماک** (ڕۆژ.): نێرینەیەکە هێلکەیەکی گونی نەمابێ، (باک.) بەرخ یا کاریلەیەکە بێ دایک بێ. ـــ ی: نەبوونی هێلکە گونێکی نێرینە، بێ دایکی کار و بەرخ.

**بیمان** (ئەردە.): فیسار، هەرامە، وانێک، هێن.

**بیمە** (ئەردە.): سیگۆرتە.

**بێمەزە**: بێ تام.

**بێمەزەیی**: بێ تامی.

**بێ مەژگ**: بێ مێشک، گێژ، گێج، گەوج، بێ مەغز. ـــ ی: بێ مێشکی، گەوجی.

**بێ مەغز**: بێ مێشک، گەوج. ـــ ی: بێ مێشکی، گەوجی.

**بیمەلەرز** (باد.): بوومەلەرزە.

**بیمرۆس** (باک.): ڕووگرژ، مۆن، غەمگین.

**بێمرێس** (باک.): بێ مگێز، بێ نیشتیا. ـــ ی: بێ مگێزی، بێ نیشتیایی.

**بێ مشک**: بیرمشک.

**بێ مشوار** (باک.): بێ فرشک، ناپایەدار. (باک.) ـــ ی: ناپایەداری، بێ فرشکی.

**بێمک**: قەمزوانی بنەوشیلە.

**بێ موو**: کەچەڵ، بێ تووک، بێ پرچ، سەرتاووسی.

**بێ مێر** (باک.): بێوەژن، ژنی بێ مێرد.

**بێ مێز** (باک.): گەورە، پان. (باک.) ـــ ی: گەورەیی، پانی.

**بێ مێشک**: گێل، گەوج. ـــ ی: گێلی، گەوجی.

**بین** (فە.): بوون، (ڕۆژ.) بینەی ژێر ناو، لەگۆماندا بەمەلە بەبن ناوێدا ڕۆیشتن (بینە)ی پێ دەڵێن.

**بێن** (موک.): بابێن، بۆکەسی دووەم و سێیەمە لەباری گەلدا: نێوە وەرن، ئەوان بابێن. (کۆ.) گەروو، تینتینۆکە، ئەووک. (باد.، بار.، گەر.، ڕەوا.): پشوو، ووچان، سانەوە. ـــ درێژ: پشوو درێژ. ـــ ی خوەدان: پشوودان، ووچاندان. (ڕەوا.): ناسوودەیی، کات، دەم، چاخ، گاڤ. ـــ یکی: دەمێکی. (هەو.، باد.): بۆن، بێهن. ـــ دار: بۆندار. ـــ کرن: بۆنکردن.

**بێنا** (باک.): هەمیشە، بێ بڕانەوە.

**بینا**: کەسێکە چاوی تیژ بێ و چتی باش ببینێ، وینا، ئاگا.

**بینەفتی** (باد.): جوورە هەنجیرێکە.

**بینفسۆک** (باک.): پەرۆشدار، خەمناک.

**بێناف**: بێ ناو، نادیار.

**بینالالە**: تینتینۆکە، قورقوراگە، بینەقاقا.

**بینانەوە**: بەستنەوە.

**بیناندن**: بارکردن. وولاخ بەستنەوە.

**بینانەوە**: دیتنەوە، دۆزینەوە. بەستنەوە.

**بێناو**: بێ ناو، بێ نێو. گومناو.

**بێ ناوکە**: کەسێکە لە ڕووکاردا دەوڵەمەند و لەناوەوە ڕووت و هەژاربێ.

**بێ ناوی**: بێ ناقی، گوماناوی.

**بیناهی**: بینایی، ڕووناکی، ڕۆشنایی.

**بینای** (هەورا.): بەستن، بەستەنی، بەستنی ئاو.

**بینایی چاوان**: مەبەس لەخودایە، خودا. ڕوونایی، ڕەوشەنی چاو، سۆما، چاو، دیدە.

**بێنە**: بەهێنە، بسێرە، بێرانە، (هەورا.) باوەڕۆ، (شەبە.، ڕۆژ.) بارە، (هەمە.) بووەوەرەی.

**بینە** (مەک.): بە پشوو خواردنەوە بەبنی ئاوێدا بە مەلە ڕۆیشتن، (کۆ.) بناو، (باک.) بین.

**بینەر**: دیتەر، دیتیار، بینیار.

**بینەکار**: بینەکەر. (باک.) جوورە هەنجیرێکە.

**بینەکەر**: ئەو کەسەیە بینەی دەکات. (باک.) ئارەزوومەند. ـــ ی: بینەکردن. (باک.) ئارەزوومەندی.

**بێنەوا**: بێ پەنا، هەژار، بێ داڵدە، قەڵەندەر، نێوی نێرینانە. ـــ یی: بێ پەنایی، بێ داڵدەیی.

**بێنەوبەستە**: بێنەوبەستە، کەین و بەین، هاتوچۆ، دەردەسەری.

**بێن بێن**: جارجارە.

**بێن تەنگ**: پشووتەنگ، هەناسەتەنگ، بێ سەبر.

**بێند** (باد.): بڵند.

**بێندار**: بۆندار. ـــ ی: بۆنداری.

**بێندان**: پشوودان.

**بێندەر** (باک.): هەوا، خەرمان. (باک.) ـــ ی: دووهێندە مستە دان (دەغڵ).

**بێندرخە**: بندرخە.

**بێندرێژ**: پشوودرێژ، بەپشوو، سینگ فراوان، ـــ بوون: بەپشووبردن. ـــ ی: پشوودرێژی، سینگ فراونی.

**بێندن** (خۆ.): بەستن.

**بێندوش** (باک.): بێدۆش.

**بێنشک** (باو.): وەنەوزە.

**بێنفرە**: (باد.) بێنفرەه، بەچیکڵدانە، پشوودرێژ.

**بێنفرەه**: بێنفرە. ـــ ی: بێنفرەیی. ـــ یی: بێنفرەهی، پشوودرێژی.

**بێنک** (باک.): بەند.

**بێنی کورزیک** (باد.): بۆنکرووز.

**بینگ**: بێن، پشوو، هەناسە.

**بێنگرتن**: خولانەوەی هێندێ چت، چەند هەناسەیێکی دووررودرێژ. قوڕقوڕاگەی کەسێکی گرتن.

**بێ نمایی زەنا** (هەورا.): بێ نوێژیی ژنان.

**بێ نوێژ**: ناپاک، پیس، پیسار، خوێنکەفتگ. ژنی ـــ: تێکەوتوو، مەهک، کنج. ـــ بوون: تێکەوتن. ـــ ی: تێکەوتن، مەهک بوون، کنج بوون، بیساری، خوێن کەفتن.

**بێ نیاز**: تێروپڕ، خاوەند دەستەڵات، دەوڵەمەند. ـــ ی: تێروپڕی، دەستەڵاتداری، دەوڵەمەندی.

**بێنین**: بەستنی وولاخ و بار و نیتر، (ڕەوا.) بەستنی ئاو، پێشگرتنی ئاو. دیتن. لەخۆڕا ـــ: لەخۆڕادیتن، پەرموون، ڕاپەڕموون، ببینە: تەماشاکە.

**بینین**: دیتن، چاوپێکەوتن. بەستن.

**بینینەوە**: دووبارە چاوپێکەوتنەوە. دۆزینەوەی چتی گوم بوو.

**بێ وادە**: نەخوازتراو، بێدەنگ، بێکات.

**بی وادەهاتن**: بێ دەنگ هاتن.

**بێ وار** (باک.): بێ شوێن، بێ جێگا. وەجاخ کوێر، بێ منداڵ، نەزۆک.

**بێ واری**: بێ شوێنی، بێ جێگایی.

**بێوە**: بێ ژن و بێ شوو: بێوەمێرد، بێوەژن.

**بیوە** (فە.): بێوەژن.

**بێوەپیاک**: ڕەبەن، بێ ژن.

**بێوەپیاو**: پیاوێکە ژنی نەمابێ.

**بێوەرج**: مرۆی گێل و گەوج و بێ کەڵک.

**بێ وەخت**: کاتی ترس و تەنگانە و بڤە، نیوەشەوێ مەچۆ دەرەوە. کاتی ڕۆژئاوایە، ئێوارە، خۆرەزەرد، زەردەمابێ. بێ دەرفەت، بێ پەرژ، بێ دەسڕەس. ـــ ی: لەکاتی ڕۆژئاوا و زەردەپەڕێدا.

**بێوەری**: بێ بەش، بێ بارە.

**بێوەژن**: بێ شوو، (سوور.) بێژن. ژن بی، ژنەبی، ژنێکە مێردی مردبێ یا نەمابێ.

**بێوەژنکۆشی**: تێکۆشین و تەقەلای بێوەژنە بۆ ژیانی خۆی و بەخێو کردنی منداڵەکانی.

**بێوەسیری**: (هەو.، هەورا.، ڕەوا.) مایەسیری، باوەسیر، (باک.) بەواسی.

**بێ وەش** (باک.): بێ هێز، بێ تین.

**بێ وەقرە**: بێ ئارام، نائارام، جیکەنە.

**بێوەڵە**: کوودەڵە بەراز و وورچ و گورجیلەسەگە، کوودەڵە، کوتک.

**بێ وەڵەت**: بڕوانە: بێوڵەت.

**بێوەمێرد**: پیاوێ ژنی نەمابێ.

**بێوەی** (جا.): بێ ڕووش، بێ زیان، بێ ئازار.

**بیوور**: تەوور، بڤر، (باک.) بەڤر، بوور.

بیوور

**بێوکە** (دەر.): مۆرانەی ووردی بەنیپە، جوورە زیندەوارێکی وورد و ڕەشە، هەر چتێکی لە لۆکە و خوری دروستکرێ دەیخوا.

**بێوڵە**: بێوەڵە.

**بێوڵەت**: شووم، نەگبەت، هەژار، نابووت و ڕووت، بێوەڵەت، بەدبەخت.

**بێوڵەتی**: هەژاری، شوومی، نەگبەتی، نەهاتی، بەدبەختی، کورد بێوڵەتی گرتوویە.

**بێوەمێرد:** بێ ژن، پیاوێکە ژنی نەمابێ.

**بێولک:** داری وزشک.

**بێونەبێ:** بێت و نەبێت وای کوتووە.

**بیویـژان (گـەر.):** مێویـژان، (بـاد.) گیایــەکی بۆنخۆشـی کوێسـتانی بەهارییە.

**بێوێژان (بابا.):** گۆیا گیایـەکی بۆن ناخۆشـە مـار حـەزی لێ ناکـات و کەلچی زۆرتر لەبەردەمی کونەکەیدا سەوز دەبێ.

**بیە (باک.):** بێ، بەهێ.

**بیەن (باد.):** پشوو، هەناسە.

**بێ هاوتا:** تاقانە، کەمیاب. ـــ یی: تاقانەیی.

**بێ هایی:** نەزانی.

**بێ هەرمان (هەورا.):** بێ کار، بێ فەرمان.

**بێ هەڤبـەر (بـاک.):** بـێ هاوشـان، بـێ هاوتـا. ـــ ی: یـەکێتی، بـێ هاوشانی.

**بێ هەمبەر (باک.):** بێ هاوشان، نایاب. ـــ ی: بێ هاوشانی.

**بێ هەمپایەکتا:** بێ هاوشان.

**بێ هەمپایی:** یەکتایی، بێ هاوشان.

**بێ هەنجیر (ئەردە.):** گەرچەک، بەتوو و دارەکەی گەرچەکی دەڵێن.

**بێ هەوەس:** بێ کەیف. ـــ ی: بێ کەیفی.

**بێهش (باک.):** بێهۆش.

**بێهشی:** بێهۆشی.

**بیهقل (باک.):** کەپۆ.

**بێهن (باک.):** پشوو، حەسانەوە. بۆن.

**بێهندان:** بۆندان، پشوودان.

**بێهنژاندن (باک.):** پشماندن.

**بێهنژین (باک.):** پشمین، پژمین.

**بیهنشک (باک.):** پشمە، پشمین.

**بێهن فەدان:** پشوودان.

**بێهوودە:** بێ سوود، بـێ کـەڵک، بێخود، بڵێت. ـــ یی: بێ سوودی، بێ کەڵکی.

**بیهۆرک (باک.):** بێ، بەهێ.

**بێهۆش:** کاس، بێهش، کەمبیر، بێخود، بێ بیر، فەرامۆشکار. بێ ئـاقڵ، کەم خیرەد.

**بێهۆشبوون:** لەهۆش چوون، بێخودبوون، لەخۆچوون.

**بێهۆش داروو:** دەرمانی بێهۆشی.

**بێهۆشکار:** بێهۆشکەر. ـــ ی: بێهۆشکەری.

**بێهۆشکەوتن:** بێهۆش بوون.

**بێهۆشکردن:** بێخودکردن.

**بێ هۆشی:** کاسی، بێخودی، بێ بیری، گەشکە، لەخۆچوون.

**بێ هونەر:** حیز، بڵح، نابەڵەد، بێکار.

**بێ هونەری:** نابەڵەدی، بێکاری.

**بێ هێز:** بێ تین، (ڕۆژ.) نیرەتی، ترکزە. ـــ ی: بێ تینی.

**بێ هێڤی (باک.):** ناهومێد. (باک.) ـــ تی: ناهومێدی.

**بێ یار:** بێ دۆست، بێ برادەر. ـــ ی: بێ دۆستی، بێ برادەری.

**بـێ یـاوەر:** بـێ یاریکـار، بـێ یـاریدەدەر. ـــ ی: بـێ یاریکـاری، بـێ یاریدەدەری.

**بێیت:** نەتۆ بێی؛ کەتۆ بێیتە ئێرە: کە تۆ بێیە ئێرە.

# پ

**پ:** تیپێکی نابێی کوردییە.

**پـا:** (لـو.، فـە.، هـەورا.، دەر.، ڕۆژ.، زەن.) پـێ، لاق، قـاچ، قـول. (هـەورا.) بـەو. ـــ ڕەنگـە: بەوڕەنگـە بـن. ـــ دیـوار: بندیـوار، ڕیشە. (ئـامێ.) ئـەدی، ئـەی. پایـە، پلـە. پیتکـەی تفـەنگ و دەمانچـە، سیپە، ماشە. ڕکێف، ئامەد. پێچک، پایە، پاچک. (مـوک.) بڕ، قام، لەبواری چۆم و زێیاندا بەکاردەبرێ بەو مەرجە پێی بگاتـە سەر زەوی: ـــ دان: بردان، قامدان. ـــ دەدا: بڕدەدا، قام دەدا. ـــ نادا: بڕنادا، قـام نـادا. (بـاد.) مرازێکـە بـۆ خۆشـکردنی سـوێندی بـەکاردەبرێ: پابسـەرێ بـاڤێ خووەکەم نەڕاستە، (باک.) بەش، بارە، پشک.

**پابەوشار (ئەردە.):** تەختەی ژێرپێی جوڵایانە، پاگیرە.

**پەپ (باک.):** دەنگ، زرینگە، تەقە.

**پابازی (ئەردە.):** دڵدارێتی.

**پابەرە (هەورا.):** دەرپێ، پابەرێ.

**پابەرجا (ئەردە.):** پاوەجێ، وایەدا.

**پابەرێ (هەورا.):** دەرپێ، (دەر.) شەرواڵ.

**پابەزەوی‌نەکەفتن:** لـە خۆشی و کـەیف و دەمـاغ پـێ وە زەوی نەکـەوتن، کەیفخۆشی، شادمانی.

**پابەس:** پابەست.

**پابەست:** پابەس، پابەند، پێوەبوو، گرفتار.

**پابەستی:** پابەسی، پابەندی، گرفتاری.

**پابەن:** پابەند.

**پابـەند:** کـۆت، پێوەنـد، پێوەن. پێوەندکراو، دیـل، ئێخسـیر، گرفتـار. پاشبەند، پێ بـەند، پێوەنـد، پـەت یازنجیرێکـە لـە دەسـت یـاپێی پـێ دەبەسترێتەوە.

**پابەنی:** پابەندی.

**پابەندی:** تووشی، گرفتاری.

**پابەیەکاهاتن (ئەردە.):** لاق تێک ناڵان.

**پاپەوی** (فە.): جیازی بووکان.

**پاپڕ**(فە.): پیلاو لەپێ.

**پاپلقە** (دەر.): پلیکان، پلەکان.

**پاپۆس** (هەورا.): پێ ما چکار.

**پاپۆسی** (هەورا.): پێ ماچکردن.

**پاپێل**: پێ‌پێڵ، شوێن پێی یەک بێڵ لە بێڵکاریدا.

**پاپ** (باک.): پاپ، خڵتەی چتی خواردنەوە لەبنی کاسەدا.

**پاپا**: بۆ منداڵێک بەکاردەبرێ، کە تازە خەریکی پێ هەڵگرتن بێ، واتا هەستە سەرپێ و پێ بگرە. سوپاسگوزار، منێ کار. ناچار. ـــ بوون: ناچاربوون. (لو.) باپیر. گەورەترین زانای ئایینی فەلە و دیانان، لەڕۆما دادەنیشێ و نوێنەری عیسایە. پایەدار، پاینە.

**پاپاجانە**: پاپەجانێ.

**پاپاچینە**: پەیژە، جێپێیە لە دیواری بیران دەهێڵدرێتەوە بۆ هاتوچۆکردنی ناوبیرەکە.

**پاپخ** (ئەردە.): کڵاوێکی ڕەش و تووکنی عەجەمانە.

**پاپەتی** (فە.): پێخوواس، پێ خاووس.

**پاپەتێتی** (فە.): پێخوواسی، پێ خاووسی.

**پاپەجانە**: جوورە پێڵاوێکی ئاوزوونەداری منداڵانەیە.

**پاپەجانێ**: پاپەجانە، پاپووچەی منداڵانەیە.

**پاپەست**: پێ پەست.

**پاپەستی**: پێ پەستی.

**پاپەل**: لکە باریکەکانی خوارەوەی داروودرەختانە.

**پاپەنجە**: پەیژە.

**پاپەی** (ئەردە.): دەربەست، دەربەند. گەڕۆک، گەڕ، وەدووکەوتوو، پشکێنەر، داخوواز، داواکار، بەشوێنداگەڕ. گەڕان، وەدوو و شوێن کەوتن، پشکنین.

**پاپک** (باک.): بێ ئەژمار، بێ پایان، بێ دوایی.

**پاپل**: (ئەردە.) وەچ و ووردەگەڵایێکە لە ژێر لق و گەڵای گەورەدا دەری دەکات.

**پاپووچ**: جوورە پێڵاوێکە وەک پانی بەرز ژنان لە پێی دەکەن، پاپووچە.

**پاپووچە**: پێچلە، (باک.) چاڕووخ، پاپۆشی منداڵان، پێ بەجانێ.

**پاپۆڕ**: کەشتی گەورەی دەریاییە، کە بەئاگر دەڕوات، ووشەیێکی فرەنسییە.

**پاپۆڕەوان**: کەسێکە، کە پاپۆڕ لێ بخوڕێ.

**پاپۆش**: ئاوەڵکراس. پێ پۆش، سۆل، کەوش، پاڵا، پێڵاو، پێتاو، پێڵا.

**پاپۆکە**: پەپەرە، پەپکە، (ڕۆژ.، کە.) مار، کە پێچ پێچ بخووات دەڵێن ـــی کردووە.

پاپۆڕ

**پاپی**: شۆڤار، سیخوڕ. پشکێنەر.

**پاپیادە** (ئەردە.): پیادە.

**پاپیساوین**: برێتییە لە پۆشین و چاوقووچاندن لە چتێک.

**پاپێچ** (ئەردە.): پێ پێچ، بەلەک پێچ. فیشەک و یا هەرچتێکی، کە باڕووتی تێ کرێ و لە ئاوور بازی و شەوی نەورۆزدا بیهاوێنە حەوا ـــی پێ دەڵێن، فیشەکەشێتە.

**پاپیلکە**: پێ پیلکە، نەردیوان

**پاپێو** (ڕۆژ.): بەپێ پێوراو.

**پات** (باک.): وەکو یەکتری، یەکسانی، (دەر.) هەویر. (ڕەوا.) بەشێکی تێر. بارە: دووپاتە: دووبارە.

**پاتار**: پڕوپاتار، پڕۆزە، پاتاڵ، (دزە.) پاتەڕۆخ، پاتاغ، پاتاک.

**پاتاغ** (دزە.): پاتار.

**پاتاک** (دزە): پاتار.

**پاتاڵ**: (کە.): شڕە، شڕوشالات، پەڕۆی شڕ. (کە.، ڕۆژ.) نازیرەک، تێ نەگەیشتوو، گێل، کەودەن، گەوج، هوڕ، هێڕ، تۆلاز، بێکارە. پڕۆزە، پاتار.

**پاتاو** (هەورا.): پێتاو.

**پاتاوە**: پێتاو، پاپێچ.

**پاتە**: پاک لەپاک، پاکەو پاک، یەکسان، لە قوماری یەڕانتوویدا، کە ژمارەی هەموو لایەکیان بە قەدەر یەکتری بێ و هیچ کامێکیان لە هیچ کامێکیان نەبەنەوە ـــی پێدەڵێن. (باک.) ڕۆژباش، سڵاو. پارچە، لەحیم. ـــ کرن: پارچەکردن، گەیاندنەوەیەک، لەحیم کردن. (باد.) پەڕۆ.

**پاتەتە**: پێ تەتە.

**پاتەخت** (ئەردە.): پایتەخت، دووێن.

**پاتەڕۆخ** (دزە.): پاتار، پاتاڵ، پڕۆزە، پاتەڕۆک، پاتاک، (دزە.) پاتاغ، ڕەچەڵەکی کەم وکووڕی و شەرم و شوورەیی کەسێکە.

**پاتەڕۆک** (دزە.): پڕۆزە، پاتار.

**پاترۆتک** (شار.): پەترۆک، پارچە، پرزۆڵە.

**پاتک**: (باد.، زا.، باک.) پژمل، پشتمل. تۆقەسەر، تۆقی سەر.

**پاتلاخ**: زناو، پەهناف.

**پاتن**: (باک.، زێ.، باد.) نانکردن، پێژتن، (باد.) پەحتن. (شەم.، مزو.) چێشت لێنان، شێولێنان. زاخ. پژمل. سووتاندن.

**پاتۆ** (باک.): گیایەکە. کۆڵووی نان.

**پاتۆرە** (باد.): کلووی بەفری.

**پاتۆرپاتۆر** (جا.): پارچە پارچە و کونکون.

**پاتۆس** (باک.): پاتۆز.

**پاتۆز** (باک.): پاتۆس، ماکینەی دروێنەیە.

پاتۆز

**پاتۆف** (باک.): گیایەکە پشتی ڕەشەوڵاخی پێ پاک دەکەنەوە لە تۆز و خۆڵ و قڕێژی.

**پاتۆلێ** (هەورا.): پانتۆڵ.

**پاتی**: (کە.، جەبا.، زەن.) مەنجەڵ، (باک.) چێشت، چاکبوون، پێکهاتوو، سووتاو، کولاو، پێگەیشتوو.

**پاتێر**: پیتەر، لەپێش زەردەشتدا ناوی خولای هەرەگەورە بووە.

**پاتیل**: دیز و مەنجەڵی زار فراوان.

**پاتێلّ** (ئەردە.): مەنجەڵۆک، مەنجەڵۆکە.

**پاتێلّ** (ئەردە.): مەنجەڵۆک، دەست مەنجەڵ.

**پاتیلە** (دەر.، دزە.): دەست مەنجەڵ.

**پاجا** (ئەردە.): بەیەکجاری، بەجارێکی، تێکرا.

**پاجە** (باک.): پەنجەرە.

**پاجەچی** (باک.): پەنجەرە ساز.

**پاجەڵە** (ئەردە.): فرفرە.

**پاجێ** (ڕۆژ.): پێ جێ، جێ پێ.

**پاچ**: (موک.، باک.) پارج، زەنگەن، چتێکە وەکو تەشووی بەڵان تەسکترە و دەسکی دارە و زەوی پێ هەڵدەکۆڵدرێ هی کورت و گچکەش بەنناش بەکاری دەبا. (باک.) پاچ. کەوای چوار داوێن، کەوا، کورتەک، کولەجە.

**پاچالّ**: پێچالّ، چالّی جۆلاّیی و ئاسنگەری.

**پاچە**: سەرو پێ، کەللەوی، کەللە پاچە، سەروپێی ئاژاڵە، کە دەکرێتە شۆرباو گیپە. پارچە.

**پاچەبەند** (باک.): پاوەند، پێوەند، چتی پێ بەستن.

**پاچەچی**: سەرو پێ فرۆش، پاچە فرۆش.

**پاچەقوڵێ** (ئەردە.): پاشقول، پشتەپا، پادان.

**پاچەکۆڵە**: جوورە پاچێکی چکۆڵە و دەمکوڵە ناودێراوی باخچانی پێ شێ و بژاردەکرێ. ــ کردن: شێ کردنەوەی دێراو و بن شینایییانە بۆ بژارکردنێ.

**پاچەی شووالّ** (ئەردە.): دەلینگی دەرپێ.

**پاچرا** (ئەردە.): چرادان، پێ چرا.

**پاچرکێ** (ئەردە.): پێ چرکە.

**پاچڤان** (باک.): وەرگێڕ، پێچڤان.

**پاچڤە**: وەرگێڕە. ــ کرن: وەرگێڕان.

**پاچڤەزان**: پاچڤان، وەرگێڕ.

**پاچک**: پێچک، پێ، پا، قاچ و قول. (باک.) پەڕۆی کۆن، دەسگرە، دەزگرە، کۆنکە، جلکی شروو ورو دڕاو.

**پاچکاری**: کارکردن بە پاچ.

**پاچکە** (ڕۆژ.): پێچکە، تەگەرە. تایە.

**پاچکەقورسی** (ئەردە.): پێچکی کورسی.

**پاچکەوناوزک**: پاچە و ریخۆڵە.

**پاچناڤ** (باک.): ناوی خواستراوە.

**پاچوولکە**: پاچی گچکە.

**پاچیک** (باک.): جۆرە گارسێکە ناخورێ و دەدرێتە وولاّخان.

**پاچین** (ڕۆژ.): هەڵپاچین، داپاچینی لکی پژوخراوی درەختان.

**پاچینە** (لو.، فە.): پلەکانێکە لە قوڕ، بەرد، گێچ، چیمەنتۆ، خشت و نیتر دروستکرابێ بۆ چوونە سەربان. (ڕۆژ.) پاپاچینە، نەردیوان، پەیژە.

**پاچینەوە** (ڕۆژ.): هەڵپاچین. بڕینەوەی ئاژاڵان.

**پاچینەوەی تەختەوجوبی** (فە.): نەردیوان، پەیژە.

**پاچینەی دار**: نەردیوان، پەیژە.

**پاخ** (زا.): پەرۆ، (باک.) ترس.

**پاخاڤ** (باک): مێزە، سەرنج. ترس، ووشیاری،

**پاخەسوو** (ڕۆژ.): بەربووک.

**پاخەلّ** (گەور.): باخەلّ.

**پاخەند** (باک.): یاقووت.

**پاخروا** (هەورا.): پێخاووس، پاپەتی.

**پاخستن** (ئەردە.): پێ خستن، لەپێ کەوتن، ماندووبوون.

**پاخل** (باک.): پاشل، باخەلّ، گیرفان. نێوانی سینگ و باسکییە، باغەلّ.

**پاخلّ**: پاخل.

**پاخلیسکان**: پێ خلیسکان، تووشی گوناه وکاری ناڕەوا هاتن.

**پاخلیسکیان**: پێ خلیسکان، پێ خزان، پا خلیسکان.

**پاخوڕ**: کای درشتی لە ئاخوڕ و توورەکەدا ماوەوەیە، کە پاشماوەی لەوەڕی وولاّخانە و نیتر نایخۆن. چەوەڵ، پاشمانە.

**پاخووا** (ڕۆژ.) دەغڵێکە بە گێرە یا بە جەنجەڕ کوترابێ بەڵان هێشتا کۆ نەکرابێتەوە سەر یەکتری و شەنە نەکرابێ. (ڕۆژ.) پاخوا. پێخوییەک قوڕ، تۆپێک قوڕ یا گەنم. (باک.) تەختەیێکی پێچکەدارە بە وولاّخەوە دەبەسرێتەوە چتی قورسی پێ دەگوێزرێتەوە.

**پاخوەشە** (ئەردە.): پێخوست، پاشێل، زەوییەکی تەڕە، کە لە بەر زۆر پێخوستکرانی ووشک بوویێتەوە.

**پاخێلّ**: (ڕۆژ.) بێڵی بەفر ماڵینییە. تەختەییێکە خلیسکی لەسەر بەفری پێدەکرێ، عەرەبانەی سەربەفرێ، (ڕۆژ.) تاخووک.

**پادار**: پێدار، بەپێ، خاوەندپێ، خاوەند پا. پایەدار، پاوەجێ. گیان لەبەرێکە بە پێیان بتوانێ بڕوا. (ئەردە.) قەدی داران و کۆڵەکەی ئەستوور. کۆڵەکە. پایەدار.

**پادارانە** (ئەردە.): پوولێکە بۆ مانەوە لەخاوەند ماڵ و سامان وەردەگیرێت.

**پاداش**: پاداشت.

**پاداشت**: تۆڵەی چاکە دانەوە، قەرەبوو، قەرەوی، ئیزا.

**پاداشت بەدی**: سزا.

**پاداشت خاسی**: ئیزا، قەرەبوو، قەرەوی.

**پادان**: بڕکردن، بردان، بۆ بوواری چۆم و زێیان بەکاردەبرێ پێ بگاتە زەوی وەکوو دەڵێن لێرەدا پادەدا یا پانادا واتە بردان و برنەدانە، پیادان. پێ لێدان، کەمدان، دزین.

**پادانە گەز**: پاداری، پایەداری، خودداری، پاگژدان، وێستان، خۆگرتن.

**پادو** (ئەردە.): جوورە داوێکە لە تاموسک مووی یالّ و کلکی چارەوێ دروستدەکرێت لە دەشت و چۆل و چیایاندا دەنرێتەوە، تەڵە، تەپکە.

**پادەرهەوا**: بەشبڕاو، بێ بەش.

**پلەدەشت** (ئـەردە.): زەوی و دەشـتێکە، کـە لـە داوێـنی کێـو و شـاخاندا هەڵکەوتبێ، پێدەشت پێی باڵندەی پێوە دەبێ لـەکاتی چینـەداو نـاتوانێ بفرێ. ـــ ی: دەشت، دەشتایی.

**پلەو:** پاکار، شاگرد، دەست و پێوەند.

**پلەشا:** بـەناوبانگ، چـیرە. شـەھ، شـا، شـاھ، مـیر، پاشـا، خونکـار، خەسرەو، کەی، کەیسەر، کیسرا، پایە بەرزترین سەرۆکی دەوڵەت.

**پلەشایەتی:** میرێتی، خەسرەوێتی، پاشایەتی.

**پلەشایی:** میری، خەسرەوی، پاشایی.

**پلەنگ:** دنگ، برنج کوت.

**پار:** ساڵی رابردوو، پارەکـە، سـاڵی پـار، مـاشەر. (رۆژ.) گلۆلـەی بـەن و دەزوو، (باک.) بەش: پارانیژی: بەشـەکەی تریشی. ـــ کرن: بەشکردن. پشت، پشتەوە، ژپاررا:لەپشتەوە.کەلاف، دەستە، کەلافە.

**پاراستن:** پاراستن، (دەر.) پارێزاندن، پـارێزتن، پـایین، (بـاک.) چناندن، چەپاڵەدان، لە زیان دوورخستنەوەی چتێک. خۆلێ ـــ : (باک.) خوەلێ چاندن، لێ وشیاربوون. خۆ ـــ :خوەدان ئالیکێ.

**پارازک** (باک.): کێشکچێتی.

**پارازۆ** (باک.): پارێزەر، کێشکچی.

**پاراستن:** پارازتن.

**پارسوو** (باک.): پەراسوو.

پارلسوو

**پارانـــەوە:** نـــزا، تکـــا، (دەر.) پاڕیانـــەوە، ئاوڕدانـــەوە، نەورانەوە، (هـەو.) شاکەشاک، (هـەورا.) واڕیانـەوە، لـە بـەر گـەڕیان، لالانـەوە، (باک.) لاڤـاکرن. لەبـەر ـــ: لەبـەر مـردن، بـە قوربـانبوون، لالانەوە.

**پاراندن** (رەو.): تـەنها بـۆ پـالاوتنی نـاوی کووپـە و گـۆزە و چـتی لـە گـڵ دروستکراو دەبێ کە ناوی دەدەڵێنن، دەلاندن.

**پاراندنەوە:** لالاندنەوە.

**پاراو:** (هـەو.، مـوک.، سـوور.) تێراو، ئـاودار، تـەڕوتازە، ڕەنگین، دژی تینووێتییە، ئاودار، بەراو. ـــ بوون: تڕهان، تێراوبوون، ئاوداربوون. ـــ کردن: تڕهاندن، ئاودان، ئاودار کردن.

**پاراوی:** ئاوداری، تێراوی، تەڕوتازەیی.

**پارە:** پووڵ، دراو. (خۆ.) پـاروو، بـەلام لەگـەڵ نـان و چێشت بـەکاردەبرێ وەکوو ـــ یەک نان. تیکە، پارچە، کوت.

**پارەپارە:** پارچە پارچە، تیکە تیکە، کوتکوت، دراو، (هەورا.) لەوێ.

**پارەپووس:** پووس پارە.

**پارەپیس:** برێتییە لە مرۆڤی ڕژد و قرچۆک و چرووک.

**پارەخشت:** لەتکە خشت.

**پارەدار:** پووڵدار، دراودار. ـــ ی: پووڵداری، دراوداری.

**پارەس** (ئەردە.): پەی، پاگا، بن بیرو ئاوان. جێ پێیە لە کەناری بیران بۆ چوونە خوار و هاتنە سەرەوە.

**پارەکە:** پار.

**پارەکەرێ پینەکەرێ:** بڕیار و پینەگەری.

**پارەکەو** (ئەردە.): بارۆکە.

**پارەکهوور** (باد.): پارە گۆڕەوە.

**پارەوپارتێن:** پشک ئاوێژتن، (رۆژ.) چەشنە.

**پارەوکە:** پارۆکە، منداڵێکە تازە پێی هەڵگرتبێ.

**پارەهەڵکەر:** خورێگـل، کلافـە هەڵکـەر، کـەلاف هەڵکـەر، چـەرخی دەزوو هەڵکەر.

**پارپار** (باک.): گیایەکە، پەڵپینە.

**پارت:** دەستە، کۆمەڵە.

**پارتی:** دەستەبەندی، بەندیواری پارت، کۆمەڵەی، لاکوشکە، هەوا خـوا، پارێزگار، برادەر، دەستەبرا.

**پارچ** (ئەردە.): پاچ.

**پارچە:** کـارتک، سـاد، کـووزی، چێنـی، برکـە، کـەرتک، تیلمـە، تیکـە، ژەنیک، پچ، فەلق، لـەت، کـوت، لـەھ، لـەتک، تیکـە، جەندەکـە، جزار، دەرقەل، دۆن، زۆلاک. چوون، چزال، کولـک، پـەترۆ، کـالا، والا، مـاوت، چـۆخ، قومـاش، قـەتک، لات، کووتـال. پـاترۆتک، پرزۆڵـە، کـەرت، پـەترۆک، پرتکـە، پسـپان، پـاری، (بـاک.) تلیـش، بـڕ، نـەهێن، پاتـە، جۆخینەکـە پارچە کـرا: برکرا. ـــ بوون: لـەت بوون، گوورین. ـــ کـردن: پاتەکردن، لەتکردن. زەوی، کورانە، حەرد.

**پارچەپارچە:** برەبرە، لەتلەتە، کوتکوت، تیکەتیکە، تلیش تلیش، لـەتک لـەتکە، پەلپـەل، پلپل، شەق وبەق، پچڕپچڕ، جربـەجڕ، شـەت وبـەت. ـــ بوون: تلیش تلیش و تیکەتیکەبوون، بەلقـەتین، فـەرژان. ـــ کـردن: برپـرو لەتلەتکردن، بەلقتاندن، جربەجڕکردن، کەربکەرکرن، پاتۆرپاتۆرکردن.

**پارچە پارچەبوون:** هلپلین، هلتەقین، هلپەکین.

**پارچە پارچە فرۆشتن:** برپر فرۆشتن.

**پارچەپارچەکردن:** هلپەکاندن، هلتەقاندن، هلپلاندن.

**پارچـەچی:** (بابـا.، هـەورا.) بانیشـکەر، خۆهـەڵکێش، بـەچاوڕواو، چاوڕواوکەر.

**پارچەفرۆش:** کووتاڵفرۆش. ـــ ی: کووتاڵفرۆشی.

**پارچمک** (باک.): چەکچەکیلە.

**پارخان** (باک.): پەراسوو.

**پارخووان** (بـاک.): هـەردووک تەنیشـتی ڕان، شـووێنە قەڵەوەکەیـەتی، سمت.

**پاردە:** (شن.) دیواری باخچە و باخانە.

**پاردوو** (ئەردە.): پاڵدوو، ڕانکی، پاڵوو.

**پارزا** (باک.): مـاکی خروێرکە. ـــ دان: کوتان بۆ خروێرکە.

**پارزەنگ** (هەو.): پارسەنگ.

**پارزن** (هەر.): پاڵوێنە.

**پارزنین** (هەر.): پالاوتن.

**پارزوون** (باک.): شیر پاڵێو، شیر پاڵۆک.

**پارزونک** (ئەردە.): کۆڵوانە، شاڵیینەی کوڵی ژنانـە. (هـەو.) چاپاڵێو، چاپارزن، پلاوپارزن، (باک.) پاڵووێنە، شیرپاڵۆک.

**پارزی** (باک.): دارێکە.

**پارزینک** (باک.): پاڵووێنە.

**پارس:** فارس. دوڕڕەشێر، دڕندەییێکە وەکوو شێری وایە، (باک.) هەژاری، بەدبەختی، دەرۆزە، سووالّ. ـــ کرن: دەرۆزەکردن، سووالّکردن.

**پارسا** (ڕۆژ.): دەرۆزەکار، سووالّکار.

**پارساک:** دەرۆزەکار.

**پارسایی:** سووالّکردن، دەرۆزەکردن.

**پارسە:** گەدایی، سووالّ، دەرۆزە.

**پارسەک** (باک.): سووالّکەر، دەرۆزەکار. ـــ ی (باک.): هەژاری، بەدبەختی، دەرۆزەکاری.

**پارسەنگ:** چاو، (هەو.) پارزەنگ، بۆ چاوگرتنەوەی تەرازوو چتێکە دەخرێتە تای سووکی تەرازوو تا بەرامبەر ڕاوەستێ، کە قاپێکی بەتالّ لە لنگە تەرازوویەک دانرێ وبەردو یا هەر چتێکی تر بە ئەندازەی قورسایی دەفرەکە بخرێتە ناو تایەکەی تر ـــ ی پێ دەلّێن.

**پارسەنگ خستنەپالّ:** ناوو ناتۆرە و چتی سووک و وێ نەچو خستنە پالّ یەکێکی.

**پارسەنگ گرتنەوە:** گرتنەوەی پارسەنگی دەفر و یاچتێکی ترو یاسەرکردنی تەرازووە بۆ ئەوەی هەر دووک تایەکانی تەرازوو جووت و ڕێک و بەرانبەر ڕاوەستێ.

**پارستن** (باک.): بەشکردن، جووایەزکردن.

**پارسکەر** (باک.): (باک.) پارسەک، دەرۆزەکار، سووالّکار.

**پارسکرن:** سووالّکردن، دەرۆزەکردن.

**پارسوو** (باک.): پەراسوو.

**پارسۆن** (باک.): پالّوێنە.

**پارسی** (باک.): فارسی. دەرۆزەکردن، سووالّکردن.

**پارشام** (ڕۆژ.): پارشێو.

**پارشەو:** پارشێو.

**پارشێو:** پاشێو، (ڕۆژ.) پارشام، جەمی دووەمی ڕۆژووانە لە پێش بانگی بەیانیدا. ـــ کردن: ژەمی دووەم خواردنی ڕۆژووانە لە بەشی دووەمی شەوێدا.

**پارڤەکرن** (باک.): بەشکردنەوە.

**پارک:** دەسگا، کۆشک.

**پارکە:** پار، پارەکە، سالّی پار.

**پارکەر** (ئەردە.): تەشیلەییێکە کەلاّفی ڕێسراوی لە سەر هەلّدەکرێ، پارگر. پێنووسێکە مەرەکەبی هەلّدەمژی و ئەوسا بەبێ ئەوەی نووکی لە مەرەکەب بدرێ هەر دەنووسی تا ئەو مەرەکەبەی لەناویدایە تەواو ووشک دەبێ، خۆنووس.

**پارکۆلە:** کوودەلّەی یەک سالاّنەی بەراز و وورچ وگورگییە.

**پارگە** (ئەردە.): کەرت، باوەڕ، کەناری کوشتوکالّ و باخچانە، کە کەمێک بلّندە بۆ هاتووچۆ تا کشتوکالّەکە پێ پەست نەبێ.

**پارگۆن** (باک.): جۆگەلەییێکە لە قەراخ چیغ و دەوار و ڕەشمالّ و خێوەت و چادراندا دروست دەکرێت تا ئاوی بارانە نەچێتە ناویانەوە، پارویّنک، پارگین، پارگێن.

**پارگوێر:** (بالە.) کەندۆ، پارێن، (هەورا.) پارێنە، (دەر.) سەنگۆ، (یەز.) پارنگۆ، گوێرەکەی سالّە وەختە، پانێر، کندۆ. ـــ ی نێر: کۆنتۆ، کووندۆ، نەهۆن.

**پارگڕ** (ئەردە.): پارکەر.

**پارگێن** (ڕۆژ.): جۆگەلەیەکە لە قەراخ خێوەتان لێ دەدرێ تا ئاوی نەچێتە نێو خێوەت و چادر و ڕەشمالّ و چیغانەوە، پارویّنک، پارگین، پارگێن، پارگۆن.

**پارگین:** پارگێن.

**پارنگۆ** (یەز.): پارگوێر.

**پارۆ** (ڕۆژ.): بێلّی دارە بۆ دەغلّ و بۆ بەفر فڕێدانێ، خاکەنازە دارینە، بێلّی شیرنیاتساز و ئاشەوانانیشە.

**پاروو:** پاری، (باک.، باد.) تیکە، ئەوەندە خواردەمەنییەیە کە بە جارێکی بتوانرێ لە زار بنرێ. ـــ گرتن: خواردەمەنی کردنە پاروو. پێمەڕە.

**پارووشک** (باک.): کلچێوک.

**پاڕۆکە** (ئەردە.): مندالّی پێڕۆکەلّە، پێڕۆکە.

**پاڕۆکەلّە** (ئەردە.): ڕەوڕەوەییێکە مندالّی ساوا دەستی پێدەگرێ تاپێی فێرە ڕۆیشتن بێ، چێشتێکە بە بۆنەی پێهەلّگرتنی مندالاّن دروست دەکرێ.

**پارووگرتن:** خواردەمەنی کردنە پاروو.

**پارووگلاندن:** پارووی زلگرتن.

**پارووگلێن:** پارووی زلگر.

**پارۆنە** (باک.): پانێری دوو سالّییە، گۆلکی پار، پانێر.

**پارۆنەک** (باک.): پانێری یەک سالّییە.

**پاڕووی کەشتی:** دار سەوڵە.

**پاڕوێنک:** جۆگەیەکە بە قەراخی چیغ و ڕەشمالاّندا لێدەدرێ بۆ ئاوەڕۆ تا ئاو نەچێتە ناو چیغ و ڕەشمالّ و دەوار و چادر و خێوەتانەوە، پارگێن، پارگین.

**پاری** (باد.، باک.): پاروو. پارچە، تیکە، کوت، لەت.

**پاڕیان** (ئەردە.): لالاّنەوە، لاّلیان، لاّلیانەوە.

**پاڕیانەوە** (ئەردە.، دەر.): پاڕانەوە.

**پارێز** (باک.): پەرێز، بێستان، پاس. کەمین، کەلێن، پارێزگە. ـــ بردنە سەرتێچڕان. ڕۆژوو، واز لە خواردنی چەند چتێک هێنان لەبەر نەخۆشی و نیتر. ـــ گرتن: بەڕۆژووبوون، خۆلێ دوور خستنەوە. ـــ شکاندن: ڕۆژووشکاندن. خۆپارێز: دەمگرتو، دلّەردوو، دەڤگری، هەرێس، لادان، خۆلادان، دژکامی. (باک.) باخچە، باخی چکۆلە. (باک.) پەرێز، بێستان.

**پارێزاندن:** پارازتن، پارێزتن.

**پارێزەر:** پاژەر، وانە، وان، پێ بەر. ئاگادار، پارازۆ، نڤاندا، ئۆتۆرڤان.

**پارێزتن:** پارازتن.

**پارێزچوون:** چوونە کەمین، نیشانگرتن، پارێزڕۆیین.

**پارێزدار:** ئاگادار، پارێزگار، بەراوان. پارێزکار، بەپارێز. ــ ی: ئاگاداری، پارێزگاری. بە پارێزی، پارێزکاری، پارێزکەری.

**پارێزران:** ڕاگیران.

**پارێزراو:** ڕاگیراو. ــ ی: ڕاگیراوی.

**پارێزرۆیین:** بەپارێزچوون.

**پارێزڤان** (باک.): ڕۆژوان. بێستانەوان. (باک.) ــ ی: ڕۆژوانی.

**پارێزکەر:** خۆ دوور خەرەوە لە هەر چتێکی، کە زیانی بۆ وی هەبێ یا دڵی لێ بکوشرێ و حەزی لێ نەکات، پارێزگار.

**پارێزکەردەی** (هەورا.): پارێزگاری.

**پارێزکردن:** خۆ دوور خستنەوە و لادان لە چتێک، لە خواردەمەنییەک، لە کەسێک، لە شوێنێک بۆ بەرژەوەندی خۆی.

**پارێزگا:** شوێنی پارێز و خۆ تێدا لە مەڵۆسنان. سەنگەر.

**پارێزگار:** پاکداوێن، (باک.) پاکداو، (زەن.) پارێزدار. پارێزەر، پارێزگەر. ئاگادار، بەراوان. پارێزکەر، دووربین. ــ ی: ئاگاداری، ئاگا لێ بوون، بەراوانی، بێبەری، ئارینەگ. پارێزکەری، دووربینی. پاکداوێنی.

**پارێزگە:** پارێزگا.

**پارێزگەر:** پارێزگا.

**پارێف** (باک.): گۆشتێکە بە تەندووری ببرژێ.

**پاریک** (باک.): پاروو.

**پاریمێ** (باک.): جۆرە گیایەکە دەخورێ.

**پارێن:** (کۆ.، ڕۆژ.، جا.، هەورا.) پانێر.

**پارین** (باک.): هی پار، پانێر، نەوەن، نۆبەن، گوێلکی دوو ساڵانی نێرە.

**پارینە:** نیوون، گوێلکی دوو ساڵانەی مێیە.

**پارێنەوە:** تکاکار، مەهدەرڤان.

**پازادە:** پازدە، پانزدە.

**پازار:** جۆرە موورووێکە دەکرێ بە تەسبیح، بەردێکی ڕەنگ سەوزی کانییە. دەرمانی دژی ژەهر، تریاک.

**پازەند:** ڕاڤەی زەند.

**پازدە:** پانزە، پازدە (١٥). (ئەردە.) دیوار، خەندەک، کەند.

**پازدەم:** پانزەم، پازدەهەم.

**پازدەمین:** پانزەمین، پازدەهەمین.

**پازدەهەم:** پانزەهەم.

**پازدەهەمین:** پانزەهەمین.

**پازگە:** چاڵێکە لە نێوەڕاستی بێستانێدا بێستانەوان بۆ پاسی بێستان بە شەو دەچێتە ناوی.

**پازناو:** دارێکە وەکوو تێلاو نوێڵ دەخرێتە ژێر پێی ئاش و پێی ئاشی پێ بەرز و نزم دەکرێت بۆ وورد و درشتکردنی ئارد بە پێی دڵخواز، پێ ئاش تا بەرز بێ ئاردی زبرە تا نزم بێت و دابخرێت ئاردی ووردە.

**پازناووک:** دارێکە وەک پیشک دەکرێ بە نوێڵ و بەرداشی پێ هەڵدەگیرێ.

**پاژ** (ئەردە.): تۆز، نەخت، چک. پاژێ: تۆزێ، نەختێ، چکێ.

**پاژەر** (باک.): ڕاگر، پارێزەر. کۆڵەلە.

**پاژەڕەژ** (هەورا.): گۆیکە و چرۆی گەڵا گوێزێیە، کە تازە دەمدەکاتەوە.

**پاژەرەش** (هەورا.): گووی مشکەی دارە گوێزانە، هەروەها گەڵا ووردەکانیەتی کە تازە دەردەچن.

**پاژنە** (هەورا.): پانێ، پانیە، پل، پەل، پاشنە، پاشنا، پانیەی پێ یا هی قۆندەرە. (کۆ.) قونپانیە، (دەر.) قوونپێنی، گوڵمە گۆشتی لای پشتەوەی پێیە.

**پاژنەکێش:** پانیەکێش، (بابا.) کەرەتە، پاژنە هەڵکێش.

**پاژنەهەڵکێش:** مرازێکی پانی کەمێک لوولە پانیەی پێ هەڵدەکێشرێ.

**پاژنەی دەرگا:** گرێژەنە، گیجەنە.

**پاژنۆ:** پاژنە، پانیە.

**پاژۆ:** دۆسیە.

**پاژوخ:** پاسوخ.

**پاژێ:** تۆزێ، نەختێ، چکێ.

**پاژی** (هەورا.): بەوی.

**پاژینە** (ئەردە.): کەپەک، زیوانی ناو دانەوێڵە، سۆس.

**پاس** (فرەنسی): پارچە قاقەزێکە وەردەگیرێ لە لایەن میرییەوە بۆ سەربەستی و دەستووری هەندێ چت. (باک.) کشانەوە، پێ دزکێ، خۆکشاندنەوە. (ڕۆژ.) بەش، پەش، بارە. پاسی شەو: بەشی شەو. پارێزگاری، کێشک، ئێشک، (دەر.) هێشک. ــ گرتن: کێشکگرتن. ڕۆژوو. ــ گرتن: بەڕۆژووبوون.

**پاسا** (ئەردە.): پێشێل، سەرپۆش. چاو پۆش، پینە.

**پاسادان:** بەخشین، بووردن، لێبووردن.

**پاسار** (هەورا.): سووانده، گورگە، گوێسووانەی بانی، ئەو گورگە وداره ڕایەیە، کە لە سەر دیوارەوە بۆ ڕووی دەرەوە دەرچووە. شوورە، سنوور، شوور. داخی دڵ، کەسەر.

**پاسارە:** ڕنوو. پاسار.

**پاساردان:** داخی دڵ پێ ڕژتن.

**پاساری:** سووانۆکە، سووانکێ، سووانديلكە، پتیک، (باک.) جەوک، چیچک، (باد.) سڤیانک. (ڕەوا.) باوانە (هی نێر). مەلیچک، مەلووچک، جۆرە چۆلەکەیێکە زۆرتر لەناو پاساراندا هێلانە دەکات.

**پاساودان** (بابا.): هەشاردان، پاکانە کردن، لەبەدناوی ڕزگار کردن.

**پاسە** (هەورا.): وا، ئاوا، وایە.

**پاسەبان:** پاسەوان. ــ ی: پاسەوانی.

**پاسەرنیان** (ئەردە.): بە شوێن چتێکیدا ڕۆیشتن، شوێنکەوتن، بەدوواداچوون.

**پاسەزانای** (هەور.): وازانین.

**پاسە مەبۆ** (هەورا.): وانابێ، کەسێکە بە تەنەکە تەقەی دەکا تا چۆلەکان لە کشتوکاڵ و بێستانان بڕەونەوە، بەڵام دەڵێ: زستان جووتیار، پایز تووتنەوان، پاسەمەرەزە ئەبووم بە داهۆڵ.

**پاسەمەرەزە** (بابا.) پارازتنی مەرەزە لەکاتی گەیشتنیدا.

**پاسەن** (هەورا.): وایە، وەهایە، (دەر.) واهەست.

**پاسەوان:** نۆبەدار، بیەگر، چۆکدار، دیدەوان، دیدەڤان، ئێشکچی، هێشکچی، نۆتۆرڤان، کێشکچی، قۆڵچی، چەرخەچی، نۆبەتچی، کێشکڤان، پاسەبان، کەسێکە ئاگاداری چتێکی بکات.

**پاسەوانە:** باج، خەرج.

**پاسەوانی:** کێشکڤانی، پارازک، کێشکچێتی، نۆبەتچێتی، چۆکداری، (باک.) پارازک، پاسەبانی، چاو بە چتێکەوەبوون، ئاگاداری چتێکی کردن.

**پاسەوانی قۆشەن:** پێش قەرەوڵ.

**پاسدان** (دزە.): دەرکردن، ڤاودان، وازلێ هێنان بە زویری نەک بەخۆشی دەرکردن.

**پاسقاڵ:** مرۆی قەشمەری و گاڵتەچی. ــ ی: قەشمەرێتی، گاڵتەچێتی.

**پاسکردن:** ئاگالێ بوون، ئاگاداری کردنی چتێک. وەڕین، گەفین.

**پاسگا:** پارێزگا، پازگە.

**پاسگە:** پاسگا.

**پاسووان:** قاقەزێکە لە میری وردەگیرێ بۆ ئەوەی بۆ هەر شوێنێکی بتەوێ بچی و لە هیچ سنوورێکیدا بەرهەڵستت نابن، پەساپۆرت.

**پاسۆتی** (باک.): قەڵەو.

**پاسوخ:** وەڵام، وەرام.

**پاسی پۆرت:** قاقەز یا پەڕاوێکی میرییە مرۆ بەهۆی وییەوە دەتوانی بە هەموو سنوورێکیدا تێ پەڕێ، ووشەییێکی فەرەنسییە: پاس: تێپەڕینە، پۆرت: دەرگا، سنوور.

**پاسی سەگ** (فە.): وەڕینی سەگ.

**پاسین:** پەسەن، هەڵنان، پێ هەڵکوتن.

**پاش:** دووا، پشتەوە، پەی، دور، گۆڕ، دما، هنگافت، دوما، (لو.) دووای چت، پشت. دڤێ پاشین، لای پاشەوە. پژێن، ئاو پاش.

**پاشا:** پادشا، میر، خونکار، شا، بەڵاَن عوسمانییەکان بۆ سەر شۆڕکردنی کورد و فارس بە ژەنێراڵانیان گوتووە پاشا.

**پاشا پاشاکێ:** دەوڵەت دامەزراندن.

**پاشا پاشاییێنە:** جوورە یارییەکی منداڵانەیە یەکێکی لە خۆیان دەکەن بەپاشا.

**پاشار** (زەن.): مشوور.

**پاشارو:** ئاراوێکە کە لە پاش (سەراوا) چتێکی تری پێ بشۆرێ، چڵکاو.

**پاشا گەردانێ:** کلاَو فڕێنی، فڕێن فڕێن، پاشا گەردانێ، بێ پادشایی، تەڤلەڤی، شێوانی شوێنێک بەهۆی نەمانی گەورە و سەرۆکییەوە، بێ پادشایی.

**پاشاگەردانی:** پاشاگەردانێ.

**پاشاگەردانێتی:** باری پاشاگەردانی.

**پاشام** (ڕۆژ.): پارشێو.

**پاشان:** پاشین، دوای، دووایە، لەوەدووا، پاشی. (هەورا.) چێکەولا. (باک.) پاشێ، لەپاشان، دپشتیرە، دپشتڤە، دووا جار.

**پاشاو:** قووناو، ئاوێکە پاشماوەی ئاوی دی بێت، ئاوێکە بۆ جاری دووەم بکرێتەوە بەسەر چایی ناو چادانیدا و بەسەر گوڵێکیدا کە ئارەقی بگیرێ، ئاوێکە بگەڕێتەوە دوواوە، پەنگ بخوواتەوە، قنگاو، ئاوێکە پاشماوەی خوواردنەوەی یەکێکی بێ کە لەبنی کاسەدا مابێتەوە.

**پاشایەتی:** پادشایەتی، میرایەتی، خونکارێتی.

**پاشایی:** پادشایی، میریی، خونکاری. (بابا.) جوورە ترێ یەکە.

**پاشایی دامەزراندن:** بنچینە میریی دامەزراندن.

**پاشەبەر:** دووابەر، پاشەرۆک، پاشبەر، پاشەبەر، پاش بەرە.

**پاشەبەرە:** (باک.) پشتنە خری. ــ ی منداڵ، دوواترین منداڵی مرۆڤ. بەری دووایی بێستان.

**پاشەخورج:** پاشکۆ.

**پاشەوین:** پاشین، هەرەدوا.

**پاشەر** (کۆ.): توانایی، تاب، هێز. ــ شکا: هێز نەمان.

**پاشەڕنە:** ڕکە، ڕنە.

**پاشەڕۆژ:** دووا ڕۆژ، پاشڕۆژ، ئایندە، ڕۆژانی لەمەودوا.

**پاشەڕۆژبین:** چەگناس. ــ ی: چەگناسی.

**پاشەڕۆک:** پاشەبەرە، دووابەر، پاشماوە، گنشتە، (دزە.) خاپەرۆک. (هەورا.) خاکەرۆ (تەنها بۆ دەغڵە). (باک.) ڕامان، تێ بینی، دەست تێوەدان، خۆ تێکەڵ کردن. پاشماوەی سەوزی و کشتوکاڵێکە، کە خاوەنی بەرەڵای کردبێ وبەری کەم تێدا مابێت.

**پاشەزین:** (دەر.) پاشقوون. (هەورا.) سەرکەفەڵ. (باک.) پشتزین. لەدووایە: ــ لەوەی: بەلەدووای وەی.

**پاشەسەر** (هەورا.): پشتەسەر، جوورە خشڵێکی ژنانە لەزێڕ یا لەزێوییە بە قولاپی لە پشت سەری قایم دەکرێت.

**پاشەسەرە:** (هەورا.) پشتەسەرە. جوورە خشڵێکی ژنانە.

**پاشەک:** پاشەکی.

**پاشەکەفت:** پاشەکەوت.

**پاشەکەوت:** وەرام، نەکەپووز، ماڵداری، ئابۆری، چتێکە گلدرابێتەوە بۆ دووایە و بۆ کاتی تەنگانەو پێداویست. نیاتە، نووتە، پەسەناز. ــ کردن: گلدانەوە، دەست پێوەگرتن. پاشڕۆژی کردن. ــ ی: دەست پێوەگرتن، پاشەکەوت کردن.

**پاشەکشە:** پاشەکشێ، کشانە پاشەوە. پەشیمانی.

**پاشەکشێ:** کشانەدوواوە، خۆدزینەوە. پەشیمانی.

**پاشەڵ:** پاشڵ، داوێنی پشتەوە.

**پاشەلەقە:** ڕۆژێکە دووای تەواو بوونی جەژنەکان، کە قوتابیان وشاگردان لەو ڕۆژەدا ناچنەوە سەر ئیشیان. کلکی جەژنە.

**پاشە لەوانە:** بەرچینە یا دووبارەییێکە دەنرێت بە دووای پلوورەی هەنگەوە بۆ ئەوەی شانەی تێدا هەڵبەستێ و هەنگووینی تێدا بکات.

**پاشەڵپیس:** کەسێکە داوێنی پشتەوەی پیسبێ. بەدناو، گومان لێکراو. ــ ی:بەد ناوی، گومان لێ کراوی.

**پاشەملە** (هەورا.): پاشملە.

**پشموانه:** چتێکه بە پاشموەی پلوورەی هەنگەوە دەنرێ بۆ ئەوەی شانەی تێدا بکات.

**پشموه:** لەپشتەوه، لەپاشموه، (شوا.) دیاوه.

**پشموپاش:** پشتاو پشت، (باک.) پاکبۆکی. (ڕەوا.) تەس. ـــ کشانەوه: تەسکردنەوه، پاشبۆکێ کشاندن، پشتاوپشت کشانەوه.

**پشباره** (پیرا.): دەستەندوو، دەستەدوو، دەستەکەوشه.

**پشبەر** (باک.): پاشبەر.

**پشبەره:** بەری هەرە دووایی بێستان. دووا منداڵ.

**پشبەن:** پاشبەند.

**پشبەند:** بەندی زین، کە دەکەوێتە لای قوونییەوه. دووا بەندی دەستە هەڵبەستان. زنجیر یا پەتێکە پێی وولاخی پێ دەبەسترێتەوه.

**پشبۆکی** (باک.): بەپێچەوانە، بەپشتەوەدا. ـــ کشاندن: بەپشتەوە ڕاکشانەوه.

**پشبین:** دووا ڕۆژبین، پاشە ڕۆژبین، چەگناس، دووابین.

**پشبینی:** چەگناسی، دووا ڕۆژبینی.

**پشپارێز:** دووپارێز. ـــ ی: دووپارێزی.

**پشپنده:** پاشمله.

**پشپێ** (باک.): گەڕانەوه.

**پشتەرک:** نەرمەزین، تەرکی پاشموەی زینی، پاشکۆ، پاشتەرکی.

**پشتەرکی:** پاشتەرک، پاشکۆ.

**پشتر:** دوواتر.

**پشترین:** دوواترین.

**پشتن** (باڵە، باک.): ڕیشوو هەڵبەستان.

**پشتیلانه** (بابا.): جیاز بەخشینەوەی دووای بووک بردنێ بەسێ ڕۆژان، کە بەربۆنەیەوە میواندارێکی تێکرایی دەکرێ.

**پشخەنه:** پاشماوەی خەنه.

**پشخەنجەر** (بار.): کێردی بەر خەنجەرێ.

**پشخستن:** دوواخستن.

**پشخووارن:** پاشماوەی چێشت و خوواردەمەنی.

**پشخووان** (هەورا.، دەر.): پاشماوەی سفره، بەرماوه، پاشماوەی سەر سفره.

**پشخووانه:** پاشخووان، پەسمەنه.

**پشخورج:** هەگبه.

**پشدار:** مرازێکی تەونییە. چەند پێشمەرگەیێکە لە کاتی ڕۆیشتنێدا دەکەونە دووای لەشکری.

**پشده:** دووا کەوتوو.

**پشدەچوون** (باک.): کشانەوه، پاشەکشێ.

**پشدڕ:** سەگی پاشدڕ، سەگی پاشگر، یانی گر.

**پشدز:** ئەو کەسەیە، کە پاسی دزان بکات، کەسێکە لە دووای دزێک یا چەندین دزانەوە ڕاوەستێ بۆ پارێزگاری و ئاگاداریان و یابە هەر چەشنێکی بێ هاوکارییان بکات.

**پشدزه:** پاشدز.

**پشدوو:** دەسته، هەوا خووا. لە پاشملەدوو.

**پشدووین:** پاشمله.

**پشرۆژ:** پاشە ڕۆژ. (باک.) ئابۆری. ـــ ی: پاش ڕۆژی. ـــ کردن: ئابۆری کرن.

**پشرۆیی:** کشانەوه، پێ دزه.

**پاش شێف** (باک.): چێشتی ئێواران. نانی پارشێوێیه.

**پشفان:** کەسێکە بۆ یارمەتی شووان بەشەو لەدەرێ دەمێنێتەوه.

**پشقەچوون:** بۆلای پاشەوە چوون، گەڕانەوه.

**پشقەدان** (باک.): کشانەوه، پاشەکشێ، گەڕانەوەدوواوه، پێ دزکێ.

**پشقەنی** (باک.): پاشگۆتنێ.

**پشقول:** پێدانە بەرپێی ئەو کەسەی، کە زۆرانی لەگەڵ دەگیرێت تا بکەوێ.

**پشقوون:** پاشەزین.

**پشکەوان:** پاشدز. پاشماشە، چەخماخەی چەکان، فیشەک فڕێدەری تفەنگ و دەمانچه.

**پشکەوته:** دوواکەوتووی بەجێماو.

**پشکەوتن:** دوواکەوتن.

**پشکەوتوو:** دوواکەوتوو، کەسێکە دوواکەوتبێ.

**پشکۆم:** ماوەی بستێک لە خووارەوەی قەفی گۆچان.

**پشکۆ:** پاشتەرک، پاشتەرکی. خورج، خورجین، هەگبە، تەرک، تەرکی، (باک.) جەم. چتێکە سووار لەپاش خۆیەوە دای ببەستێ. (باک.) چونکوو. جەماڵەک.

**پشکێ** (باک.): ئەوجا، ئەوسا، لە ئەنجامدا.

**پشگەز** (بابا.، جا.): پەشیمان، ژیوان. ـــ بوونەوه: پەشیمان بوونەوه. ـــ کردنەوه: پەشیمان کردنەوه. (بابا.، جا.) ـــ ی: پەشیمانی.

**پشگر:** لە دەستووری ڕێزمانێدا پاشبەندی هەڵبەست. پاشدڕ، یانی گر. سەگێکە لەپڕا بگرێ. ـــ ی: یانی گری.

**پشگۆ:** پاشمله بێژ.

**پشگۆتن** (باک.): پاشمله.

**پشگۆتین** (باک.): پاشمله. ـــ کرن: پاشمله لێ دووان.

**پشڵ:** داوێنی لای پشتەوه، پاشەڵ، (لو.) پامان، (هەورا.) دامنه. پاڵوویەکە چەند زەنگوڵەیێکی پێوە بێ. ـــ پیس: داوێن پیس. ـــ پیسی: داوێن پیسی.

**پشل** (باک.): باخەڵ لە نێوانی سینگ و مەمکان، گیرفانی دیوی ژوورەوەی کراسییه. (باد.) گیرفان.

**پشماشه** (ڕۆژ.): چەخماخەی چەکانە، پارچەیێکە لە تفەنگ، کە فیشەکی پێ فڕێ دەدرێ.

**پشماک:** شره، میرات.

**پشماک گر:** شرەگر.

**پشماک گرتن:** شرە گرتن.

**پاشماڵە:** پشت ماڵە.

**پاشمامان:** مامانێکە، کە لە پشتی زەیستانەوە دادەنیشێ لە کاتی منداڵ بوونیدا.

**پاشماوە:** خاکە ڕژ، ماوەوە. بەرماوە، پێما، خارن مایی، بنک (باک.)، پاشەرۆک، (هەورا.، دەر.) پاشخوان، بۆ ماوەوەی هەموو چتێکی بەکاردەبرێ بە تایبەتی بۆ ئەو خواردەمەنیەی کە لەبەردەمی ئەم و ئەودا دەمێنێتەوە.

**پاشماوەخۆر:** بەرماوەخۆر. ـــ ی: بەرماوەخۆری.

**پاشمەرگ:** منداڵێکە دووای مردنی باوکی بووبێ.

**پاشمەرگە:** منداڵێکە دووای مردنی باوکی لە دایک بووبێ.

**پاشمەنە:** پاشمەندە.

**پاشمەندە** (ئەردە.): خووان.

**پاشملە:** چێر، پشتملە (هەورا.)، پاش یندە، (لو.) پشتی سەر، پاشگۆتین، پاشدوویی. لە ـــ لە من دەدوێ: چێری من دکا.

**پاشملەیی:** باسکردنی یەکێک لە پشتەسەری واتا بەنهێنی وی.

**پاشمێر** (باک.): ئەو کەسەیە لە شەڕێدا یارمەتی برادەرێکی یا خزمێکی خۆی بدات، هەڤالدار.

**پاش نووێژ:** (باک.) پشتی نیڤرۆ، پاشنیڤرۆ.

**پاشنیڤرۆ:** پاش نوێژ.

**پاش نیوەڕۆ:** دووای نیوەڕۆیە.

**پاشوو:** دوو پێیەکانی لای پشتەوەی وڵاخانە. هەستانەسەر ـــ: شەهرابوون.

**پاشووەن** (ئەردە.): پاشبەند.

**پاش وپێش:** دووچتە، کە پێشوو یان پاش و پاشوو یان بە ناڕەوا پێش خرابێ.

**پاشۆڕ:** ـــ ی مردووان: تاتە شۆر، (هەورا.) تەختەشۆر، (هەورا.) بەردە پێ.

**پاشوور:** شوورێن پێ لێ شووشتن.

**پاشووراو:** پاشاراو.

**پاشۆڵ** (موک.): کۆش، بەرهەڵبێنە یا کۆڵوانەییێکە، کە چتی لەنێو بکرێ وەکوو کۆش، پاشەڵ.

**پاش هەڵگیر:** دووپشتەکی سووارابوون.

**پاشێ:** (باک.) لە پاشان.

**پاشی:** (باک.) دووایە، پشتەوە، پاشی، پاشێن، دووایی. ـــ خووەماڵی: گەڕانەوە، جڵەو سووڕاندنەوە.

**پاشێڤ:** (باک.) پارشێو. پارشیو.

**پاشێڵ:** (ئەردە.) لەقشێل، پێ شێل، زەوییەکی قوڕ لەبەر ئەوەی کە زۆر هاتو چۆی بە سەردا بکرێ ووشک و پێپەست بووبێ.

**پاشێن:** پاشەرەوە، بڵاوکەرەوە، پەخش کەرەوە.

**پاشین:** (باک.) دووایی، ئیتر، ئیدی. (خا.) چاندن.

**پاشینە:** ئی دووایی.

**پاشێن:** لە دووایییدا، لە ئەنجامدا.

**پاشێو:** پارشێو، کورتکراوەی پاش شیوە.

**پاشاری:** خودداری، پاداری، پشوودرێژی، بێندرێژی.

**پاڤان** (باک.): لە قومارێدا هاوبەشی کردن.

**پاق** (باک.): پاک، خاوێن. ـــ کرن: پاک کردنەوە. لوولاک.

**پاقژ** (باک.): نەرمایی بەلەکێیە، بەلەک. پاگژ.

**پاقژە:** پەلەقاژە.

**پاقژی:** (باک.) پاکی.

**پاقلانچکە:** گیایەکی بەهارییە گەڵایەکی درێژی برکە برکەی هەیە، بەرێکی سووری وورد دەگرێ و زۆریش ڕەوانە.

**پاقلاوە:** جوورە شیرنیاتێکە لە شەکر و گوێزی کوتراو و ڕۆن ونانی تەنک چین چین دەکرێ و هەروەکوو لەوزینە دەبڕێ.

**پاقلە:** کاکرۆس، جوورە گیایەکی بەهارییە دەچێنرێ بەرەکەی کەلووی درێژە چەند دەنکێکی تێدایە بە کوڵاوی و لەناو چێشتیشدا دەخورێ.

**پاقلە کێویلە:** جوورە پاقلەییێکی کێوییە.

**پاقلەمارانە:** بڕوانە: پاقلە کێویلە.

**پاقلۆک** (باک.): لوولاکی گەورەیە.

**پاقلیر** (هەورا.): گووێزێکە پەلکە شینەکەی پێوە مابێ.

**پاقلێرە** (هەورا.): گووێزێکە تیکوڵە شینەکەی پێوە مابێ.

**پاقلینچکانە** (ئەردە.): گیایەکە وەکوو پەڵپێنە دەخورێ.

**پاقولاخ:** (ئەردە.) سمی مەڕو بزن و ئاسک.

**پاک:** (باک.) لەنێوانی پاک و پیسیدایە، پاکە واتا زۆر پاک نیەو زۆریش پیس نیە. خاوێن، پاکژ، پاقژ. (دەر.) پێک. (لو.) پییێک. ئاڤیژە، جنجلی. ڕووناک، پەتی. ـــ بوون: خاوێن بوون. ـــ کردنەوە: پێک کردن، خاوێنکردنەوە، لیل کرن، ڤەوەژارتن. پلووچ کرن (بۆ گوێز و خەیار و ئیتر). ـــ بوونەوە: خاوێن بوونەوە. برێتییە لە مردنی پیاوی خراپ، دەڵێن خووا زوو پاکی کاتەوە. تەواو، تێکڕا، هەموو، خڕ، سەرپاک، گشت. نا ـــ: پیس، دز، بێ بەخت.

**پاکار:** (کرما.) کوێخا، گزیر. (ئەردە.) نۆکەر.

**پاکانە:** دڵپاک کردنەوەی یەکێک بەسووێند. بێ گوناهی، بێ تاوانی. ـــ کردن: پەڵە و بەدناو لە خۆ دوورخستنەوە، سووێند خواردن، ڕێگاپاک کردنەوە. (بابا.) هەشاردان.

**پاکە** (ئەردە.): پاکی، خاوێنی.

**پاکەپاکە:** پەتاتە، یارەڵماسی.

**پاکەت:** لەک، (باک.) پاکێت، کاغەزێکە یا مقەواییێکە لە کارخانەدا پێچرابێتەوەو چرێشی تێدرابێ وەکوو قوتووی جگەرە، هی شخارتە و ئیتر. پێچۆک، بەستە، تاخە، کەروانک، دەست پێچک. ـــ ی نامان.

**پاکەفتن:** پێشکەوتن، پێشهات، هەڵکەوتن.

**پاک کردن:** تیکوڵ لێ گرتنەوە. بژار کردن، بە بادادان، دابێژتن. پاک وخاوێن کردنەوە.

**پاکەگمیز** (هەورا.): پێشاوگە.

**پاكەمی** (ئەردە.): ماندوویتی، مانگی. ـــ کردن: مانەوە، ماندووبوون.

**پاكەوەبوون**: پاکبوونەوە. ڕەنگ نەمان. بریتییە لە مردن و لە ناو چوونی کەسێکی کە حەزی لێ نەکرێ وخراوبێ.

**پاكەوپاك**: هیچ لە هیچ، (دەر.) پێک و پێک. لە دان وستاندن یا لە قوماری، کە هەردووک لا هیچیان لەسەر یەکتری نەمێنێ.

**پاكەوبوون**: پاک بوونەوە.

**پاكەوبوونەوە**: پاک بوونەوە.

**پاكەوكردن**: پاککردنەوە، خاوێنکردنەوە. دەردان، گەسکدان، ماڵین. بڕین وسەروبەر کردنی دار و باغ. لابردن، هەڵگرتن.

**پاكەوكریاگ**: پاک کراوەوە، خاوێنکراوەوە. دەردراو، گەسکدراو، ماڵراو. بڕاو، سەروبەرکراو (دار و باغ و باخچە)، هەڵگیراو، لابراو.

**پاكتر**: خاوێنتر.

**پاكترین**: خاوێنترین.

**پاكخوو**: خۆشخوو، خۆشڕەفتار. ـــ ی: خۆشخوویی، خۆشڕەفتاری.

**پاكداو** (باک.): پاکداوێن، پارێزگار. (باک.) ـــ ی: پاکداوێنی، پارێزگاری.

**پاكداوێن**: پارێزگار، داوێن پاک، (باک.) پاکداو. ـــ ی: پارێزگاری، داوێن پاکی، پاکداوی.

**پاكدڵ** (باک.): دڵپاک.

**پاكدڵی** (باک.) دڵپاکی.

**پاكردن**: پەیکردن، پابڕین، پێ بڕینەوە. کورتی هێنان، سەرکردن، لە نیشانە نەدان.

**پاكردنەوە**: خاوێن کردنەوە. تیکوڵ لێکردنەوەی خەیار و تریزوو نیتر. بژاردن و خاوێنکردنەوەی دەغڵ و دان لە خاک و خۆڵ و زیوان. پێکرانەوە.

**پاكڕوو**: ڕووپاک، ڕووخۆش. ـــ یی: ڕووپاکی.

**پاكز**: پاک، خاوێن. لەوەڕ یا دارستانێکە قەدەغە کرابێ.

**پاكزدان**: نەهێشتنی گیاو خەڵە لە زەویدا بەهۆی دروێنە یا دەسکەنەوە یابە هۆی خوواردنی ئاژەڵانەوە.

**پاككردن**: پاکردن. ـــ ەوە: پاکردنەوە.

**پاكڵ**: (ئەردە.) ئاگر خۆشکەر، هاندەر. کڵی پرد، پایەی پردان.

**پاكڵە**: (ئەردە.) پاکڵ.

**پاكلیرە**: پاکردنی کەمکۆڵ.

**پاكۆ** (جا.): گیا لەبنەوە دروون و لێکردنەوە.

**پاک وپاراو**: تەڕ و تازە و خاوێن، (دەر.) پاک و پاریاو.

**پاک وپاراوی**: تەڕو تازە و خاوێن، پاک و پاریاوی.

**پاک و پاریاو**: تەڕ و تازە، خاوێن. ـــ ی: تەڕ و تازەیی و خاوێنی.

**پاک و پووک کردن**: بەختکردن و بەخۆڕایی چتێک دان بە کەسێکی: دەستمایەکەت هەموو ـــ کرد: واتا بەفیڕۆ چوواندت.

**پاک وپیس کردن**: جووێکردنەوەی چتی چاک و خراپ لە یەکتری.

**پاكوت**: کوتانەوە و شێلانی سەربان بەپێ بۆ نەهێشتنی درز و قەڵشتان لەکاتی باراندا تا دڵۆپەی نەکات. پێکوت، پێپەست، پێشێل. نەرم، سووک، پەست.

**پاكوترە**: گیایەکە لە پاقلانچکە دەچێ و دەخورێ.

**پاكوتكێ**: (ئەردە.) پێ بە زەوی دادان، سمکۆڵی چاوەڕێ.

**پاكۆدان**: ڕنینەوەو دروێنەکردنی گژوگیا بە دەست، بریتییە لە نەهێشتنی چت.

**پاكووڕ**: (ڕۆژ.) کۆڵ (لە دەست وپێیان).

**پاكوڕ**: (ڕۆژ.) پێکوڕە، بێچووە کوللە لەپێش باڵگرتنێدا.

**پاكوڕە**: کووللەی باڵ نەگرتوو، پێکوڕە. پیادە، نۆکەر، خزمەتکار.

**پاكوڵ**: (ڕۆژ.) پێکورت.

**پاكۆڵ**: (ڕۆژ.) سمکۆڵ.

**پاكێ**: خاوێنی، پاگژی، پاقژی. (باک.) خاوێن. باشە، واتا نە باشە و نە خراپە، قەیدی نییە.

**پاكێت**: (باک.) پاکەت.

**پاكێتی**: خاوێنی.

**پاكیزە**: پوخت، پاکزادە. خاوێن. ناوی ئافرەتانە.

**پاكێش**: وولاغ، چوارپێ.

**پاگ** (باک.): زەوی کردار لێنەکراو.

**پاگا**: پایە، شان، دەرگانە، ئاستانە، بگار، پاڕەس، پەی، پاگە.

**پاگە**: تەویلە. ئاستانەی دەرگا، پاگا.

**پاگەزدان**: پایەداری، وێسان، وێستان.

**پاگەند** (باک.): یاقووت.

**پاگەهـ، پاگە** (هەکا.، باک.): تەویلە.

**پاگران** (باک.): پێگران. (باک.) ـــ ی: پێگرانی.

**پاگرتن**: پێ گرتن، ڕێ ڕۆیین.

**پاگژ**: پاک، خاوێن.

**پاگژتر**: خاوێنتر.

**پاگژترین**: خاوێنترین.

**پاگژی**: خاوێنی، پاکی.

**پاگوشادانە**: بەرتیلێکە بەبۆنەی هاتنی میوانەوە پێشکەش دەکرێ.

**پاگوشانی**: پێکرانەوە، پاکردنەوە، دەرگای هاتوچۆکرانەوە.

**پاگون**: نیشان، درووشم، درووشمی سەر شان.

**پاگیر**: گرفتار، دووچار، دەربەست.

**پاگیرە**: (ئەردە.) پانەوشار.

**پاگێڕە** (ڕۆژ.): بە کوتانی جۆخین دەڵێن بەهۆی گێڕەوە، پاهۆرە، پێ هۆلە، پێ گێڕە.

**پال**: (ئەردە.) تەپۆڵکە. (باک.) پاڵ.

**پاڵ**: ـــ پێوەنان: ڕەپێش خستن، بەدەست ئاژۆتن، پاڵپێڕانان، پاڵدان، کزری، تەکاندان، چەپاڵەدان، لەتر، دانان، دەست پێوەنان. پاڵدانەوە: پشت بە بالیف یا دیوارو چتێکەوەنان بۆ حەسانەوە. (دەر.) تەلاّقدانەوە.

سایە، سێبەر. ـــ دانەوە: پشت بە کەسێک قایم کردن، خۆ بە لە ژێر سێبەری کەسێکی خستن. بە ـــ : پشتیواندار. بێ ـــ : بێ پشتیوان. پاڵ کەوتن: پاڵ بە چتێکەوەدان، درێژبوون بۆ نوستن یا بۆ حەسانەوە. ـــ دانەوە: پشت بە دیوار یا دار و یا بالیفانەوەنان. ناو، نیو، بال. لە پاڵ نەوێناندا راکشاوە: لەناو نوێناندا. (شار.) ملە، کە. قەد، بەرقەد. ـــ کێوان: بە بەرقەدی کێواندا. لە ـــ وە: بەدزی، بەنهێنی، بەکاوەخۆ. لە ـــ دابوون: لە پەناو لە ژێر سایەو داڵدەدا. وە ـــ دان: دانەپاڵ. تەنیشتی گیاندار، پاڵوو، کەلەکە، پووتەگا. پشت: پاڵی لێداوە.

**پاڵ** (هەورا.): پێڵاو، کەووش، سۆڵ، قۆندەرە.

**پالاخ:** (موک.) پەلخ، (هەورا.، زەن.) کەدەگ، گوور (لور.). گوێلکی گامێشییە، (شکا.) دولبە. گەلای ووشک و وەریوی درک ودالە.

**پالاخ:** (پیرا.) پەلەغ، گیایەکی سێ سووە و یەک یەک لەنێو ئاوێدا کۆما کۆما تا بەژنێک بڵند دەبێ، پالاغ زۆری پێخۆشە بیخوا. هێوەرە، پالاخی سێ سالانەیە.

**پالادرانە:** (هەورا.، ئەردە.) پێڵاودرانە، کاڵەدرانە، پامز. خەرج وباجێکە پیاوی ئاغا لەمسکێنی دەستێنی لە کاتێکیدا، کە مسکێن قەرزداربێ جگە لە قەرزەکە ـــ ی خۆشی لێدەستێنێ، کە پێی دەڵێن باجی سەربار.

**پالاس:** دۆشەگێکی گچکەیە لە پارچە پەڕیان دروست دەکرێ. (باک.) لێفە. راییخێکە لەژێر دۆشەگ راخرابێ.

**پالافتە:** پالاوتوو، پالاوتە.

**پالافتن:** (رۆژ.) پالاوتن، (باک.) پالاندن، شیر یا کەرەی تواوەو بە شیرپالۆک یا هێڵەگ دادەکەن تاخلتە و موو و چتی تری لێ بگرن.

**پالامز:** رژنی کەرەیە، کە شوان لەبری مزی شووانێتی دەیچنێتەوە یاکرێیەکە شووانان لە باتی شووانانەی خۆی لە خاوەن ئاژاڵی دەستێنێ.

**پالان:** (لو.، فە.، رۆژ.، دەر.) کورتان، کۆپان، کووپان.

**پالانە:** پالاغ، خوری و مووییەکە لە کاتی بڕینەوەدا بەسەر پشتی مەڕ و بزنانەوە بۆ جووانی دەهێڵرێتەوە.

**پالانتە:** پالانچەی گونج.

**پالانچە:** ماسولکە گۆشتی باڵ بڕ بڕەی پشتێیە. خڕکە بەرد، لەتکە خشت، بەردو قوڕوقسڵێکە دەدرێتە پاڵ گونچکاری پالان. ماسولەکە خورییە، کە بۆ جووانی لەسەر پشتی هەندێک بەران و مەڕی قشت دەهێڵرێتەوە. بەرد و قوڕ، قسلێکە وەپاڵ گونجی ئاو دەدرێ.

**پالاندروو:** کورتاندروو.

**پالاندن** (باک.): پالاوتن، پاراندن بپالینە.

**پالانەوور:** (لو.، رۆژ.، دەر.) کورتان.

**پالانقەجەری:** کورتانی قەجەری.

**پالانی:** گوریدرێژێکە، کە کاتی کورتان لێکردنی هاتبێ و فێرە سوورراری و بار بردن بکرێت.

**پالاو:** پێڵاو.

**پالاوتە:** پالافتە، پالاوتوو، پاڵفتە.

**پالاوتراو:** پالافتراو، پاڵێوراو.

**پالاووراز** (هەورا.): کەوشدروو.

**پالاوتن:** (دەر.، رۆژ.) پالافتن، پالاندن، (باک.) داوەرڤاندن، تلاندن، پاارزنین، پالین، ترهاندن. داوەراندن، پالفتە کردن. خەوشگرتنی شلەمەنی بە چتی چنراو ئیتر. هەلاتن لەترسان.

**پالە:** کارکەر، کارگەر، وەرزێر، کرێچ، دروێنکەر، براندۆغ، (باک.) براندۆک، (کە.) درەوەنی، سەپان، درەوان. (هەو.) کرێکاری دەخڵی، رەنجبەر، کرێگرتە. (جەبا.) پێڵاو. شاری گەورە. بەشێکە لە دەغل کە سەپانێک بیدروێتەوە لە رۆژێکا: ـــ یێک جۆ یا گەنم هەیە، کە سەپانێک لە رۆژێکیدا بیدروێتەوە.

**پالەپال:** (باک.) قایم، رەق.

**پالەپەستۆ:** پالنانی زۆری بە نهێم بە گیانداریکەوە. پالەو پەست، پالەوپەستۆ.

**پالەپەینان:** پانیەلێکدان.

**پالەژێردەرچوون:** خلیسکان.

**پالەفان:** (باک.)پالە، پالەکار. پالەوان. ـــ ی: پالەیی. پالەوانی.

**پالەقە:** پێلاقە، پێلەقە، لەقە.

**پالەقۆچە** (زینوە): سەرمەقولات.

**پالەمێر** (باک.): ووریا، هونەرمەند. (باک.) ـــ ی: ووریایی، هونەرمەندی.

**پالەنگ:** (رۆژ.) شەل. (ئەردە.) رەشمە و مەهار.

**پالەوان:** پالەوان.

**پالەوان:** قارەمان، ئازا، گەرناس، مەیداندار، کورد، کانبۆرە، پەهلەوی، بەل، زۆردار، (باد.) پەلیوان. کەللە، دەسکەللا. پالوان. نێوی نێرینانە.

**پالەوانە:** (کە.، رۆژ.) دیوار یا ئەستوندەیێکی دەمەکییە لە تەنیشت دیواری شکست دادەمەزرێ، گولتە، تیرەک، پشت کۆڵەکە. جوورێکە لە مازوو. فیلپایە، کۆڵەگە، پایەیەکە بدرێتە ژێر شووێنی زەدەداری شکست. تەیرەن ئەبابیلە، بالندەیێکی رەشی گچکە و باڵ درێژە بەهاران پەیدادەبێ ئیتر گۆیا دووای نیوەی هاوینێ بزر دەبێ، بالندەی ناوبراو هەمیشە بە حەواوەیە، کە بنیشێ ناتوانێ بفڕێ ئێوارانیش لە سەر دار و بن سوواندان دەنیشن تا لە بەیانیدا بتوانن خۆ فڕێدەن و بفڕن خوواردنیشیان لە حەواوە مێش ومێشوولەیە.

**پالەوانە کەچەڵ:** گەمەیەکە پێی دەڵێن گەمەی شالەلم.

**پالەوانبازی:** زۆرانی پالەوانان، زۆرانبازی.

**پالەوانی:** قارەمانی، (باک.) گەرناسی، پەهلەوێتی.

**پالەوەدان:** پالدانەوە، درێژبوون.

**پالەوپەست:** پالەپەستوو، پالەوپەستوو.

**پالەوپەستۆ:** بروانە: پالەوپەست.

**پالەهەنگ:** زنجیری گەورە، کە دەکرێتە پێی بەندییانەوە، دەست بەندی وولاخانە. چتێکی نەرمە لە ژێر زین لە پشتی وولاخی دەکرێ تا زینەکە پشتی ئازار نەدات.

**پالەیی:** کرێکاری، رەنجبەری، وەرزێری، سەپانی.

**پالیشت:** چتێکی نەرم ونووالە بۆ پاڵ پێوەدانێ. ـــ نان: سەرین دانان بۆ پاڵ پێوەدان. ـــ نراو: پالدراو.

**پاڵپێوەدان:** پاڵدان بە چتێکەوە.

**پاڵپێوەنان:** پاڵدان.

**پاڵتاو:** (کە.) پاڵتۆ، (هەورا.) قاپووت، باڵاپۆش. پاڵوو.

**پاڵتەک:** بەرد تاش.

**پاڵتەک:** دەردێکە لە قورگی ڕەشەوولاغ پەیدا دەبێ، هەڵدامسێ و هەڵیدەدرن گەغی تێدەخەن چاک دەبێتەوە.

**پاڵتۆ:** قاپووت، ساقۆ، پاڵتاو، ووریە. ـــ ی شڕ: (ڕۆژ.) جەتە. ناوی چیرۆکی (گۆگۆلە).

**پاڵچم:** (باک.) پەلچم.

**پاڵخستن:** ڕاکشاندنی گیان لەبەرێک، درێژکردن، ڕاکێشان.

**پاڵدامێن:** قەراخی خوارووی داوێن، داوێنی شاخ وگرد.

**پاڵدان:** پاڵدانەوە، پاڵپێوەنان، پشت پێوەنان. هەڵپەساردن.

**پاڵدانەوە:** پاڵکەوتن، پاڵکەفتن، پاڵەوەدان، بۆ حەسانەوە. پشت پێوە بەستن.

**پاڵداوێن:** پاڵدامێن، داوێنی کێوی.

**پاڵداینە:** (ئەردە.) پاڵداوێن، داوێنی کێوی.

**پاڵدە:** پاڵووی کورتان.

**پاڵدراو:** پاڵگەهـ، بالگە، پاڵپشت نراو.

**پاڵدراوی تەواو:** گوزارەی تەواو، ووشەی کاری تەواو لە ڕستەسازیدا.

**پاڵدراوی ناتەواو:** گوزارەی ناتەواو، ووشەی کاری ناتەواو لە ڕستەسازیدا.

**پاڵدم:** پالدێم، داوێن.

**پاڵدوو:** پاڵووی کورتان و زینییە. تەنگەی پشتەوەی زین وکورتانییە.

**پاڵدووف** (باک.): پاڵوو.

**پاڵدێم:** داوێن.

**پاڵدیوار:** پەنای دیوار، تەنیشت ماڵێ.

**پاڵران:** پاڵێوران.

**پاڵراو:** پالافتراو.

**پاڵسەنگ** (خۆ.): پارسەنگ.

**پاڵشت** (ڕۆژ.): پشتگرتن، جەخت، پاڵپشت، پشتیوان. ـــ کردن: کەسداندن. ـــ دان: پشتگرتن. ـــ کران: کەسدین.

**پاڵفتە:** (ئەردە.) پالاوتە، دابێژراو، پاڵێوراو، بێژیاگ، والاویت.

**پاڵفتەکردن:** پالاوتن، دابێژتن.

**پاڵقانچک:** (باد.) بندیوار، پشت دیوار، کن دیوار.

**پاڵقۆزە:** (بار.) پلقوزە. (کە.) کەچەرە. مام جیژنۆکە. (هەورا.، سەق.) مەتی. گیایەکە تۆزێک تیژە و دەخورێ.

**پاڵک:** (باک.) جورە سمێڵێکە. دارێکە سەرێکی ئەستوور و سەرێکی تەنکە لەنێو مژانە و پرکێدادەنرێ تا شێفل نەبێ. پاڵ، باڵ، تەنیشت.

**پاڵکەفتن:** پاڵکەوتن، درێژبوون، هەڵاژیان.

**پاڵکەوتن:** پاڵدانەوە، پاڵەوەدان، پاڵکەفتن، درێژبوون وکەوتن، بەلاداهاتن، ڕاکشان.

**پاڵکورسی:** (باک.) کورسی بە پاڵەپشت.

پالکورسی

**پاڵکی:** (ئەردە.) کەژاوە.

**پاڵگە** (باک.): سەرین، سەنیر. پاڵگەهـ. سەرچاوە، چاوگە.

**پاڵگەهـ:** پاڵگە.

**پاڵ لێدانەوە:** دڵنیابون، گووێ دنجبوون، ئاسوودەبوون.

**پاڵە:** پاڵمە.

**پاڵمە:** (پار.، هەو.، کەل.، کورد.) گیا بەرخۆڵەیە بە زەویدا پان دەبێتەوە، کە بپسێ شیری لێ دێ تامی وە ئالەکۆک دەچێ. شنک، ئسپنک.

**پاڵمتە:** گیایەکی بەهارییە تامی وە ئالەکۆکی دەچی.

**پاڵنان:** پاڵ پێوەنان. هەڵپەساردنی چتێک بە چتێکەوە.

**پاڵنگ:** (هەورا.) پڵنگ.

**پالۆ:** شارۆچکەیەکە لە باکووری شاری دیاربەکرییە پایتەختی ئێلی (دومەلی) و (زازا) یە لە پالەوو پەهلەو هاتووە (زازا و دومەل) پەهلەویی کۆنن زمانی وانیش وەکوو پەهلەوی کۆنە. شێخ سەعیدی پالۆیی، کە شۆڕشی کرد و لە ڕێگای نیشتمانیدا لە دیاربەکر بوو بە قوربانی کوردستان لە پالەوی ئەم شارەیە.

**پاڵوو:** (ڕۆژ.) ڕقەبەری، بەربەرەکانی. دارێکە دەدرێتە بەر نێی ئاش بۆ نەجووڵانی. کەلەکە، پەراسوو، دەنکە. نەقیزەگاز. قایش یا کە ژوویکە دەکەوێتە بن کلکی ووڵاخانەوە تا لەنگەری زین و یا کورتانی ڕابگرێت لە بن کلکی توند نەبێ بەڵکوو دەکەوێتە سەر کەفەڵی. پاڵدوو، پاڵدووف، پالووف، قوشقوون، (باد.) پالی.

**پاڵوانە:** پاڵوێنە. باڵندەیێکی ڕەشی باڵدرێژی لاق کورتی تیژ ڕۆیە، کە بکەوێتە سەر زەوی ناتووانێ بە ئاسانی بفڕێ.

**پاڵوتن:** پالاوتن، پالافتن.

**پاڵووبەن:** پشتیوان و یارمەتی دەر. ـــ ی: پشتیوانی، بەهاوارەوە گەیشتن.

**پاڵووبەند:** بڕوانە: پاڵووبەن. ـــ ی: پشتیوانی.

**پاڵووتە:** (باک.) زبارە، بیگار، کاری بەخۆڕایی، بەدەستی کۆمەڵە و بەنۆبە کار و کرداری یەکتری بکەن. دەستە، کۆمەڵە.

**پاڵوودان:** (ئەردە.) پاڵدانەوە.

**پالوودە:** ساردەمەنییێکی هاوینییە لە بەفرو یا لە سەهۆڵ و ڕیشاڵی نیشاستە و یا سێوی لە ڕەندە دراو دروست دەکرێت.

**پاڵووگێڕ:** دارێکە دەدرێتە بەر نێی ئاش کاتێکی کە بەلایەکیدا سەنگ بێ.

**پالۆز:** (هەو.) هەفتەی شەشەمە لە هەشت هەفتەکانی، کە کەوتۆتە نێوانی پیت وخدرلاس.

**پاڵوش:** (باک.) تێکەڵاو.

**پالووف** (باک.): پاڵووی ووڵاخان.

**پاڵووگیر:** بڕینی بن کلکە لەبەر زەبری پاڵوورا.

**پالووێنە:** (هەو. ،موک.) شیرپالێو، شیرپالۆک، شیروانە، (هەورا.) پەرزەوان، شۆپ پەرزن (باک.) پارزۆنگ، پارزینگ، (هەو.) پارزن، پارزۆنگ، (دەر.) شیرپالوو، پارسۆن، (باک.) ترهانۆک، سکجێس.

**پالی** (باد.): پالوو.

**پاڵێ** (شا.): دار یا ئاسنێکە وەبەر دەرگا یا پەنجەرە بدرێ تا نەکرێتەوە، (هەورا.) پاشکۆڵ، کەوش، سۆل، پێڵاو.

**پالێدان:** پاقولی، پاچەقولی، پادان، پشتی پێ لێدان، پێ وەبەر پێ دان.

**پالێدان:** پێ لێدان.

**پالیر:** باخچە.

**پالیک** (باک.): مووی ریشە، کە بخرێتە سەر سمێڵ بۆ درێژی.

**پاڵێن** (ئەردە.): کەوگیر، ئاوپاش.

**پاڵین:** پالاوتن.

**پاڵێوران:** پالاوتران.

**پاڵێوراو:** پاڵراو، پالاْفتراو.

**پاڵێوکە:** دەفرێکی پانی کونکونە، چتی پێ دەپاڵێورێ، پاڵووێنە، پاڵین، کەوگیر.

**پاڵینگ** (هەورا.) پڵینگ.

**پاماسی:** پاماسە، پێ هەڵاْمسان، نەخۆشیەکی پێیە.

**پاماڵ:** پتیوار، رەوس. پایەماڵ، تێداچوو، لەناوچوو، تالاْنکراو. ـــ بوون: پتیواربوون، پایەماڵ بوون. ـــ کراو: پایەماڵکراو. ـــ کردن: پایەماڵکردن، پتیوارکردن.

**پاماڵ:** پایەماڵ، پێشێل، ژێرپێ، لە قەشێل.

**پاماڵە:** ماڵە. چتێکی درێژ یا چوارچێوە دارە بەتەیان دەتەنرێ و زەوییەکی پێ ماڵە دەکرێ کە تۆوی پێدا کرابێ بۆ ئەوەی گلمەت وکستەکەکان بشکێنێ و ووردکات و هەم تۆوەکەش وە ژێر خاکی خات تا چۆلەکە نەیخۆن.

**پامان** (لو.): پاشڵ.

**پاماو:** لووسکردنی سوواخی گەچ بە پەڕۆی تەڕ.

**پامەرە:** پێمەرە، خاکەناز.

**پامەمەری:** سەردوولکە، سەردوولکەبێژ.

**پامز:** (ئەردە.) پالاْدرانە، پێلاودرانە.

پامەرە

**پامووره:** پاوانە، (هەورا.) پاموورە، زەنگیانەی ڕەش وشین بە سێ لیپ دەهۆنرێتەوە و لەپێ دەکرێت.

**پامێزە:** گووی هەنگە، کە لەسەر کانی دەیکا دووای ئاو خواردنەوە کە سەرێکی خڕو سەرێکیش باریکە، هەنگدۆز تەماشای دەکا سەرە باریکەکەی رووی لەهەرلا بێ دووای دەکەوێ تا پلوورەکەی دەدۆزێتەوە تا هەنگوینەکەی دەرخات. خوری ومووی دەست و پێی ئاژاڵ. ناوی ووشک بووەوەی ئاولینگی سابرێن لە کاتی ئارەزووکردنی پەڕیندا و دووای پەڕین.

**پان:** بەرین، پەهن، (باک.) بێمێز. پەروی، لێپلات، پۆڕ، پێن، (دەر.) مەست. بە پێچەوانەی تسک. (باک.) کار، ئیش. پان، پێن. ـــ بوون: تەپسین. ـــ بوونەوە: پەهنین. ـــ کردن: پەهناندن، تەپساندن، تۆلکرن.

**پانا:** بەرینی، پانایی.

**پاناوە:** تەختایی سەری کەژ و کێو.

**پانایی:** بەرینایی، بەرینی، (دەر.) پێنایی. پەهن، پەهنایی.

**پانەخرج:** منداڵێکە کورت و پان و نەستووربێ.

**پانەکی:** جوورە قفڵێکی پانکەڵەیە.

**پانەوەبوون:** پان بوونەوە.

**پانەوبوون:** پان بوونەوە، پلچیان، پلچەوبوون، ڕەخنەگیران.

**پانەوکردن:** پانکردنەوە، داخستن. ڕاخستن. پلچەوکردن، پخچ کردن، ڕەخنەگرتن.

**پان بەپان:** مەبەس لەقسەیەکی بێ پەردەیە.

**پان بوونەوە:** پڵیشانەوە.

**پانپانۆکە:** کوسکوسانێ، پانپانۆکێ.

**پانتاو:** تەخت. تەپڵسەری کێووگردێکە کە تەخت بێ. تەختایی سەر خەرمان.

**پانتاوی:** پانتاو.

**پانتۆڵ:** (بابا.، هەورا.) دەمەرقۆپان، پاتۆڵێ، (دەر.، ڕەوا.، هەر.، فە.، هەو.) شەڵوار، (هەر.) ڕۆتک کە دوولنگەو بێ نێفەک بێ. باندۆڵی کاتژمێری.

پانتۆڵ

**پانجەقولێ:** (هەورا.) پاشقول.

**پاندان:** خۆنووس، پێنووسێکە مەرەکەبی هەڵدەمژێ و ئیتر تا مەرەکەبەکەی ناوی ووشک دەبێ هەر دەنووسێ.

پاندان

**پاندرووس** (باک.): ناتەواو.

**پانزە** (هەورا.): پازدە.

**پانزەم:** چتێکە لە پایە و باری پازدەی دابێ. پانزەمین.

**پانزدە** (باک.): پانزە، پازدە.

**پانزدەم:** پازدەهەم.

**پانزدەمین:** پازدەمین، پانزدەهەم، پانزەهەمین.

**پانک** (بار.): مەلاْشوو.

**پانکە:** جوورە ماسییەکی خڕ و پانە گۆشتی خۆشە پێستی زگی نەستوورە. جوورێکە لەبەری دارە مازوو وە دوگمەی دەچێ. جوورە باوەشێنێکە بەهێزی کارەبا دەخولێتەوە.

**پانکەڵە:** چتێک کەمێک پان بێ.

**پانکردنەوە:** پڵیشاندنەوە.

**پانگ** (باک.): قولانج. نێوانی قامکی گەورە و شادەیە بەڵێک کراوەوەیی.

**پانگەه** (باک.): تەویلە. ئەنباری گەنم و ئیتر.

**پانوپۆڕ:** پان وفرە، پان وفرەوان، پان و بەرین.

**پانۆکێ:** جوورە دروومانێکە.

**پانۆڵە** (ڕژ.): کورت و قەڵەو، قوڵەبنە، کوڵەبنە، تێکسرماو، تێکسمراو.

**پانی** (باد.): پانیه، (هەورا.) پاژنه. بەرینی، بەرینایی، پانایی. (باک.) بێمێزی. بەری چت لەلای تەسکییەوە.

**پانیان بەگیان**: لەگیان خۆشبوون.

**پانیە**: پانی، (باد.) پەهن. (شووا.) قنجەی پا. (باک.) پشت پەهن. پاژنه، قوونپاژنه، قومپاژنه. (کۆ.) قونپانیه. (دەر.) قوونپێنی. پانیەی کەوش.

**پانیە بەند**: پانی بەرز. ـــ دروو: پانی بەرز دروو.

**پانیە کێش**: پانیکێش، پانی کێش، پاژنەکێش.

**پانی بەرز**: پانیەبەرز، پێڵاوێکی ژنانەیە وەکوو سۆڵ بەلاّم پاژنەی بەرزە.

**پانی بەرز دروو**: کەسێکە تەنها پێڵاوی پانیە بەرز بدروێ.

**پانێر**: (کۆ.، ڕۆژ.، جا.، هەورا.) پارێن، (دەر.) سەنگۆ، (یەز.) پارنگۆ، (زەن.) لامێش، (باک.) پارۆنە، پارنێر، گوێلکە نێری پارەکەی واتا دوو ساڵانەیە.

**پاوان**: پاوەن، پووشوو، پاوەن، ڕەپەن. قۆرغ، قەدەغە. (دەر.) پاوەند. (هەورا.) کۆز. لەوەڕگەی ئاژاڵان. (باد.) کێشک.

**پاواندا**: پاموور، پاموورە. خڕخاڵ، چتێکی زەنگوڵەدارە لە زێڕ یا زیو دەکرێتە پێی منداڵان بۆ جوانی.

**پاواندار** (باد.): کێشکچی.

**پاوە**: نێوی مەحاڵ و ئاوایییەکییە لە هەورامان. پاوان.

**پاوەپا** (ئەردە.): پێ دزکێ، پاشەکشێ. ـــ کردن: پێ دزکێ کردن لە کارێکا، پاشەکشێ کردن. گومان، نیگەرانی، دوودڵی. دەستی دەستی. ـــ پێکردن: دەستی دەستی پێکردن. ئاسوودەیی.

**پاوەپاکردن**: گومان کردن، دوودڵی کردن.

**پاوەجێ**: پایەدار، پاپاوەجێگە. ـــ کردن: پایەدار و قایمکردنی چت.

**پاوەجێگە**: پاوەجێ.

**پاوەرە** (هەورا.): دەرپێ.

**پاوەرێ**( هەورا.): بڕوانە: پاوەرە.

**پاوەرمانگ** (ئەردە.): ژنێکی ئاووسە، کە پێی نابێتە مانگی نۆیەم.

**پاوەن** (هەورا.): خڕخاڵ، پێوانە. (جا.، ڕۆژ.) پێوەند، سندم، سمەدم، زنجیری دەست وپێی یەکسمان. پاوانی گیاو پووش. بخاو.

**پاوەند** (دەر.): پاوان.

**پاوەیو** (هەورا.): پێ خەسوو.

**پاوەی وەھ** (هەورا.): (موک.) بووکنی، ئەو ئافرەتانەن، کە لە ماڵی زاواوە دەچن بووکێ دێنن.

**پاوپل**: پێ وئەندام، پێ وپەل، قاچ وقوڵ، لاق ولەتەن. هێز، توانا، شیاوی.

**پاوپۆز**: پێ وبەلەک.

**پاوخووا** (ڕۆژ.): پاخووا.

**پاودان** (ڕۆژ.): دۆخ، بار، چۆنێتی، چلۆنێتی.

**پاوور**: پزوو، پرزانگ، منداڵدان.

**پاووروا، پاخروا** (هەورا.): پێخواس، پێخاووس.

**پاووریای** (هەورا.): (فە.) پاپەتی، پێخوواس، پێخاووس.

**پئۆر** (باک.): ڕیخۆڵە.

**پاوقوول**: قاچ وقول، لاق، قاچ.

**پاومان** (ڕۆژ.): دووایی.

**پاومانگ**: پێ ومانگ، ئەو مانگەیە، کە ماڵات یا ئافرەتی ئاووسی تێدا بزێ.

**پاووشک**: پێ بەشەڕ، پێ وقەدەم شووم.

**پاوموری**: جووره مەقامێکی کوردییە.

**پاوونە**: پێوەندێکە لە پێدەکرێ.

**پاهەڵکەفتن**: هەڵکەوتن.

**پاهەڵکوتن** (ئەردە.): پێ هەڵکەوتن.

**پاهەڵگر**: پێ هەڵگر.

**پاهەڵگرتن**: پێ هەڵگرتن، گورجبوون.

**پاهەڵگیر**: وولاغ، چارەوا.

**پاهۆڵە** (ڕۆژ.): پێ گێرە، پاگێرە، پاهۆرە. کوتانی خەرمان بەگێرە نەک بەجەنجەر و ئیتر.

**پای** (باک.): بەخت. پەی، بۆ، پای بالاکەت.

**پایان** (هەورا.): دووایی، کۆتایی، بنەبان، ئەنجام. بە ـــ گەیاندن: کۆتاکردن، بردنەسەر. گەیاندنە ـــ: کۆتاکردن، بردنەسەر. بێ ـــ: بێ دووایی، بێ ئەنجام، (باک.) پاپک.

**پایە**: پەیسک، ئابروو، ناموس، شان، جێگا، جێ، دەستەک، دەرقیل، گڤاند، بەرزی شان. پایە بەرز، پلە بەرز. پلیکان، دەهکەر، ئاڤەند، (باک.) پێلپەلک، هیم، پەرەسە. پێچکی کورسی وئیتر. (باک.) کێشکچی. کۆڵەکەیە لە بەرد یا خشت و گێچ وقسڵ ونیدیکەیە تا سەری داری بخرێتە سەر. پایەی پردی یا خانوویەران. ـــ کەمکردنەوە: زۆر بەهرکرن. گەورەییێکی نرخداری دەست ڕۆیشتوو.

**پایەبەرز**: گەورە، مەزن، پایەبڵند، (باک.) بلندجە، شان بڵند، جێگە بەرز.

**پایە بەرزی**: (باک.) بڵند جهی، شان بڵندی، جێگە بەرزی، گەورەیی، مەزنی.

**پایەبڵند**: جێگە بەرز، پایە بەرز، بڵند جە. شان بڵند، گەورە، مەزن، سەرەک.

**پایەبڵندی**: جێگە بەرزی، پایە بەرزی، شان بڵندی، گەورەیی، مەزنی، سەرۆکی.

**پایەدار**: بەردەوام، پایدار. خۆگر، ڕاوەستاو، بەرگەگر، بیلەبت، (باک.) ڤەبری. (باک.) فرشک. ـــ بوون: مان، خۆگرتن. ـــ کردن: بەلیاندن، (باک.) ڤەبرین. ئابروومەند، بەناموس، خاوەند شکۆ، گەورە، مەزن، خاوەند پایە. نا ـــ: چوواریینە، دلکۆچەر، بێفرشک، بێ مشوار، کەڤرقولپتی. نا ـــ ی: بێ مشواری، بێ فرشکی.

**پایەداری**: ڕاگیری، ڕاگیراوی، ڕاوەستاوی.

**پایەماڵ**: پاماڵ، پتیوار، دەوس، بەرباد. ـــ بوون: پاماڵبوون، تێداچوون. ـــ کران: پاماڵکران، دەوسین. ـــ کردن: تێداچوواندن، بەرچڤاندن، پتیوارکردن، زیان پێگەیاندن.

**پایەماڵی:** بەربادی، پەتیواری.

**پایەناز:** پایەنداز.

**پایەنداز** (هەورا.)**:** ئەو فەرشانەن کە بۆ پێشوازی میر و خونکار و پادشایان لەبەر پێ یان بە سەر شەقامدا ڕادەخرێن.

**پایەندازی:** ڕاخستنی فەرشان بۆ پێشوازی میر وخونکار و پادشایان.

**پایەوی** (فە.)**:** جیازی بووکان.

**پایتەخت:** دوڕێن، (شەم.) دیڤێن. (باک.) پایێ تەخت. شارێکە پادشا یا سەرەک کۆماری تێدا دانیشێ.

**پایتوون:** فایتوون، گالیسکە.

پایتون

**پایدۆس:** پایدۆست.

**پایدۆست:** دەستوور. دەست لە کاروکردار هەڵگرتنی مەردوم، تەواوبوونی هەموو کارێک، کار ڕاوەستاندن. ــ کردن: دەست لە کار هەڵگرتن، ئازادکردن. بڕانەوەی جەنگی دەوڵەتان وناشتبوونەوەیان.

**پایدۆستی:** وودم، دەستوور.

**پایماڵ:** دابەشینی شڕەیە بەسەر شڕەگراندا. تالانکردن.

**پایماڵی:** تالانی.

**پایناو:** قنگاوی مەرەزە یا کشتوکاڵ. شیناوەردێکی ناسکی تێراوە.

**پاییز:** پەهیز، پەییز، (باک.) چری، (فە.) سەردوا. کەشێکە برێتییە لەم سێ مانگانە: ڕەزبەر، خەزەڵوەر، سەرماوەز، کە لەنێوانی کەشەکانی بەهار و زستانێدایە لە(٢١)ی ئەیلولی دەستپێدەکا تا(٢٠)ی کانوونی یەکەم.

**پاییزە** (موک.)**:** کشتوکاڵێکە پاییزان بچێنرێت. جوورە ترێیەکی پاییزی دەنک خڕی سپی ئاودار و بزمارکوتە. جوورە گۆرانییەکە. (باک.) پاییزۆک.

**پاییزەبرا:** بە برادەر و هاواڵ و هاوڕێیەک دەگوترێ، کە ماوەیەک دوورکەوتبێتەوە یاخۆی دوورخستبێتەوە.

**پاییزەڕێز** (ئەردە.)**:** چتێکە سەرمای پایزی لێی دابێ و کاری لێکردبێ.

**پاییزخێر** (باک.)**:** گیای پاییزییە.

**پاییزۆک** (باک.)**:** (موک.) پاییزە. جوورە گۆرانییێکی کوردییە.

**پاییزی:** جوورە هەنجیرێکە وەکوو یەحیا بەگی. پایزە.

**پایکردن** (باک.)**:** دابەش کردنی چتێک بەسەر چەند کەسێکا.

**پای من:** لەملی من، لەئەستۆی من، لەسەر من.

**پایین:** لای خوارەوەی چت. (باک.) پارازتن، چاوەڕێیی. (باک.) پان.

**پایناز** (ئەردە.)**:** چەند ووتارێکی جووانە، کە لە خۆشی هاتن و بەخێر هاتنکردنی کەسێکیدا بەکاردەبرێ.

**پایناو:** قنگاو، قوناوی مەرەزە و کشتوکاڵ. سەوزێکی پاراوی نازکە، تەڕ، نزم ئاو. سەوزێکی ناسکی تێرئاوە.

**پایەناو:** پایناو.

**پایندە:** پایەدار، پاوەچێ.

**پایین وکۆی** (هەورا.)**:** داوێنی کێوی.

**پە:** مرازی واق ووڕمانییە. پەح، پەحا.

**پەپ** (شار.، هەورا.)**:** گەمەیێکە کە گوتیان پەپ لە پیرۆتی، چەپۆکی پێدادەدەن وهەموو منداڵەکان هێرش دەبەنە سەر پیرۆت.

**پەپاخ:** پپاخ.

**پەپە** (کە.، ڕۆژ.)**:** پەپک، نان (زاراوەی منداڵانە). کولێرە. (هەورا.) گردە.

**پەپەرە:** پاپۆکەی ماری.

**پەپەرک:** وورشە، بەردە تراویلکە.

**پەپرک:** بەردە تراویلکە.

**پەپک:** (ڕۆژ.) پەپە، (فە.)کولێرە، ئەستورک. (باک.) پێی مەڕ و بزن و ئیترە.

**پەپکە:** گونک، گرموڵە، گوتکە. (کە.، ڕۆژ.) پاپۆکەی ماری. (ئەردە.) ئەنگوتکە هەویری پانکراوەوەیە. خەرمانی گێرەکراوە، کە هێشتا شەنە نەکرابێ. خەروای هەنجیر و پەنیر و ڤیر. گونک، (ئەردە.) ئەنگوتکە هەویری پانکراوەوەیە. ــ بەستن: پەپکەدان، پاپۆکەکردنی مار. ــ خوواردن: پەپکەبەستن، پێچ خواردن وجینگلۆوانی مارە. ــ دان: پەپکەخوواردن.

**پەپکە مالینچکانە** (ئەردە.)**:** تۆڵەکە.

**پەپلە مەلینچکانە** (ئەردە.)**:** تۆڵەکە.

**پەپلانیۆز** (لو.)**:** نێرتکی زەل کە بەناسکی دەخورێ.

**پەپلەقۆزێ** (کە.)**:** چەنگە قۆزێ.

**پەپوو:** هۆپەپۆک، بایەقوش، باڵندەییکی جووانی سەر بەکڵاوەیە، پەپووسلەمانکە ڕەنگی زەرد و سپییە دندووکی باریک ودرێژە باڵندەییکی بۆگەنە. (باد.) داوودکیلەونکل. تەواوبوو، برا، نەما، هەپوو، (کۆ.) ئاپوو.

**پەپووەقژە:** باڵندەیێکە وە پەپووسلێمانەی دەچێ، بەلام بێ تاجە (زاراوەی منداڵانە).

**پەپووەکەرە:** کوندەبەبۆ.

**پەپووسلەمانکە:** پەپوو، باڵندەیێکی زەرد و سپییە ڕەنگارەنگە دندووکی باریک ودرێژە، شانە و تاجی لەسەرە بەقەد کۆترێکی دەبێ.

**پەپووسلێمانە:** پەپووسلەمانکە.

**پەپووسلێمانکە:** پەپووسلەمانکە.

**پەپووقژە:** باڵندەیێکە وە پەپووسلەمانکە دەچێ بەلام بێ کڵاوە.

**پەپووک** (شێخ.، باد.، باک.)**:** کوندەبەبوو، باڵندەیێکی شەوییە دەنگی وەکوو پشیلە یا منداڵی ساوا وایە باڵندەیێکی خەمگینە تەنها بەشەو دەگەرێ ژنانیش وەکو هەیرۆ بەکاری دێنی. بێ دەسەلات، هەژار، بەدبەخت، بەلەنگاز، تەپەسەرا.

**پەپۆکە** (خۆ.، ڕەوا.)**:** کولێرەی بچووک، خەپلە کە بۆ منداڵان دەکرێ.

**پەپووکەرە:** کوندەبۆ.

**پەپۆلە:** سەرە گونکە هەویرێکە، کە لەدووای نان کردن دەمێنێتەوە دەکرێ بە نیوەنانێک.

پەپووکەرە

**پەپوولە:** پەلبەلاسینک، پەلەتیڤک، بەلاتینک، (باک.) پەرپەریک. (دەر.) پەرپوولە. پەشپوولە. پەروانە. بەلیتانک، (باک.) پەریتانگ. پرپریک، منمنیک، (باک.) پلپلە. (برا.) پەلەسەیوانۆک.

(هەر.) پەلاتووتک. (بالـە.) شەریفۆک. بالندەیێکی گچکەیـە، هەیـە بەگرداگردی چرادا دەخولێتەوەو ئەوانی تریش بەسـەر گـوڵ وگوڵـزاران دەنیشن. نەخۆشییێکە لە بزن ومەڕاندا سەرهەڵدەدا.

**پەپوولەپاییزە:** چتێکی قژقژاوی خڕی سووکە پاییزان لەگولی دڕکی، کە لەوێ پەیدا دەبێ. باویلێ.

**پەپوولەهەڵهێنان:** جووره نەخۆشییێکە لـەتینوێتی یـا لەگـەرمای زۆرەوە تووشی ئاژەڵ دەبێ.

**پەپوولەی کرمی ئاوریشمی:** پەپوولەی کرمی ئارمووشی.

**پەت:** پارچە گوریسێکی قوڵەیە. گردێنک، پەتک، (ئەردە.) پەلەتک.

**پەتا:** پەسیو، درم، درمانـە، درمـی. (هەمـە.) پـەتۆ. بـاهۆر، ئارسم، هەلامەت. گرانەتا. نەخۆشییێکی پێ درێژە بۆ مرۆ و مـالات وکشتوکاڵ. لەپەیێکی گەرمە لە جێگای بە ئازاری لەش دەنرێ.

**پەتاتە:** سیفەزەمینە، کرتۆپە، کارتۆل، گازۆڵە، ڕتاخ، خرکەگازوولە.

**پەتە:** کۆنـە لبـاد و جـەوال و گوریـس وهـەر کۆنـەیێکی لـە خـوری ومـوو دروستکرابی لـەنێـو ئـاوێدا دەیخووسێنن وبـەکوتان دەیکـەنـەوە خـوری، بەنێکی لەوخوریەی دروستکرێ پەتەی پێدەڵێن وهەر چتێکی لەوبەنەش دروستکرێ پێیدەڵێن لە پەتەی دروستکراو. پەتەک. (هەورا.) نـانکردن. پارچـە قاقـەزێکی تایبـەتی نووسـراوە دەدرێ بەوکەسـەی کـە پارەیـەکی لێوەربگیرێ.

**پەتەر** (ڕۆژ.): کلۆڵی، ڕووشە، گێچەڵ.

**پەتەری:** پەتیارە، شێت، دێوانە، گەوج.

**پەتەک:** پەتە.

**پەتبڕ:** پەت پسێن. یاخی، بارنەوەر، بارنەبەر، سەرکێش، سەرپێچ.

**پەتپەتی:** تیمار و پێچانی برین. دەردەسەری، چەرمەسەری، کەتن.

**پەتپەتی پێکردن:** دەردەسەری وچەرمەسەری دانی یەکێک.

**پەتپەتێن:** ئازار، چەرمەسەری.

**پەت پساندن:** سەرکێشی، یاخیبوون، بەزاچ، لامۆفەک.

**پەت پسێن:** پەتبڕ. یاخی، بارنەبەر، بارنەوەر، سەرکێش، سەرپێچ.

**پەترمە:** پەیوەندکردنی دارودرەخت.

**پەترۆ:** پارچە، پرزۆڵـە تووێژی تەنکی سەر برینانە.

**پەتروو:** گۆشتە زوونەی برینان.

**پەتروو برینی** (هەورا.): قرتماغەی سەربرینان.

**پەترووخە:** گۆشتە زوونە.

**پـەترۆک:** پارچـە، تیکەڵـە، کـوت. ـــ یـک نـان لـەماڵماندا نییـە: کوتەنانێکمان نییە.

**پەترۆکە:** تووێژە تەنکەکەی سەربرینانە. گۆشتە زوونەی برینان.

**پەترۆکەو زەخمی** (هەورا.): تووێژ و قرتماغی سەربرینان.

**پەترۆل:** گاز، ماز، نەوت.

**پەتشان** (باک.): ڕزان، ووردوخاشبوون، فلیقانەوە، تولانەوە.

**پـەتک:** پەتـە، پەت، پەلـەتک. پـەت یـا گوریسـێکە لەکۆنـە گوریـس وجەوال ولباد و تیتر دروستدەکرێ دووای ئـەوەی، کـە لـە ئـاوێدا خووسان وکوتران وشێکرانەوە و بەدارانەوە کرانە بەن.

**پەتکەر:** کەماندار، کەمانکێش.

**پەتک پەتکانێ:** گەمەیەکی کچانە.

**پەتکراو:** کەمانکێشراو.

**پەتکردن:** پەت لە ئەستۆی مالات و سەگ کردن. بەستنەوە و ڕاکێشانی. هێنانە ژێردەست، خستنە ژێرفەرمانەوە.

**پەتڵە** (هەورا.): ساواری کولاو و نەکوتراو، ساوەر. دانەوێڵە.

**پەتۆن:** هەناسە، پشوو. دەردێکی گـرت ـــ ی نەدا. (هەمـە.) پـەتا، درم، درمانە، پەسیو، درمی، باهۆڕ، ئارسم. نەخۆشییێکی پێ درێژە.

**پـەتوو:** بـەتانی، پێخـەفێکی خـوری و ئەسـتووری تووکـنی سـوواوەیە، ئەبیال.

**پەتۆت** (باک.): چتی ڕزیوی پەڕپووت.

**پەتهەڵخستن:** پەتهەڵاوەسین. خنکاندن، لەداردران.

**پەتی:** خۆڕوو، وێـژە، خووری، ڕووت، قووت، کۆت، خاوس، خوواس، کرۆک، سادە. پا ـــ : پێخوواس، پێ پەتی. کوردی پەتی: کوردیەکە هیچ ووشەی بێگانانی تێدانەبێ. (فە.) بەتاڵ، چۆڵ، پێخووس.

**پەتیار** (ڕۆژ.): پەتکراو، ڕەسەنکراو، ڕەسەن لەمل خراو.

**پەتیارە:** دێوانـە، شێت وشڕ، شێتۆکە، بەرەلا. بێ عـار، هێڕ، خوێڕی، گەریدە، شێت وشوور، ناشیرین.

**پەتێ پەتێ** (کۆ.): دارەدارە.

**پەرچ:** بزمار یا سینگێکی ئاسنە، کە سەرێکی لـە دیـوی نـاوەوە پـەرچ درابێتەوە.

**پەچە:** (موک.) جێگایەکە لـە بـەهار و هـاوین و پـاییزاندا شـەوانە مـەڕ و بزنـی لـێ مۆڵـدرێ. (هـەو.) هـەوێز. (بانـە.) پەرچـە. (شـکا.) حەوشـە. (ڕۆژ. ، کـە.) ڕووبـەندی ئافرەتانـە، پێچە. (هـەورا.) کـۆزی بەرخانە، مۆڵگە ئاژاڵانە. پێچە، ڕووپۆش، ڕووبەند. نانکردن.

**پەچەتە:** پارچەیـەکی چووارگۆشەی سپییە لـەکاتی نـانخواردندا بەسـەر کۆشدا دەدرێت.

**پەچە خووز** (ئەردە.): مێگەل لە زەوی کردن بۆ بەهێز کردنی.

**پەچە خووس** (ئەردە.): پەچەخووز.

**پەچەک** (ئەردە.): جووره پەنیرێکە.

**پەچدانەوە:** پەرچدانەوە.

**پەچنین:** کۆکردنەوەی خەفەت لە دڵدا؛ مردم هێندی خەفەت پەچنیە دڵم.

**پـەح:** پـە، هـا، هاهـا، پـەحا. بـۆ واق وورمـانێ بـەکاردەبرێ. پـەه، پەهپەه، پەح.

**پەحا:** ئاها، هاها، تەح، تەححا، پەح، پەححا. بۆ واق وورمانێیە.

**پەحپـەح:** بـەه، بەهبـەه، پـەح، پەهپـەه. لـەکاتی واق وورمـان و پەسندکردنێدا بەکار دەبرێت.

**پەحتن** (زا.): کولاندن.

**پەحتی** (باک.): چابوو، پێکهاتوو، سووتاو، چێشتی لێنراو، کولاو.

**پەحح:** بۆ سەر سووڕمان بەکاردەبرێ؛ ـــ چەمن زیرەکە!.

**پەححا:** پەحح.

**پەحلەوان:** پاڵەوان.

**پەحن** (باد.): پان.

**پەحنایی** (باد.): پانایی.

**پەحنی** (باد.): پاژنەی پێ. پانی.

**پەحین** (باک.): بەپێ لێدان.

**پەخ**: پەخە، پخ. زاراوەی منداڵانە لە بەرانبەری چتی جوواندا بەکار دەبرێ. چتێکە قۆقزو دم و یا نووکە تیژەکەی تەخت بووبێ. ــ بوون: کول بوون. ــ کردن: کولکردن. پان، داشیکیاگ، شکاو.

**پەخت** (هەورا.، جا.، ڕۆژ.): تەدارەکی مردوو ڕێکخستن.

**پەخش**: بلاو، وولاو، پەرت، پەرش. چرژ، پەرێشان. (باک.) بەردبار. ــ وبلاو: پەرش و بلاو؛ کاکۆلی بە سەر شانیدا ــ بووە. ــ بوون: بەردباربوون، پەرت بوون، بلاوبوون، پژان، پرژان. ــ کراو: پەرتکراو. ــ کردن: پەرتکردن، بلاوکردن. ــ کردنەوە: بلاوکردنەوە، پشاندن، پژاندن، پرژاندن. ــ کەرەوە: پەرت و دابەشکەرەوە، دابەشێن.

**پەخشان**: (سوور.) خووەخسان. پەرت، بلاوکران، تەخشان. نێوی ئافرەتانە. ــ بوونەوە: پەرت بوونەوە. ــ کردنەوە: بلاوکردنەوە، پشاندن، پژاندن، پرژاندن.

**پەخشای** (هەورا.): پەخشین.

**پەخشە** (فە.): مێش. (ڕۆژ.) مێشوولە، پێشکە. (لوڕ.) توورفانە، مێشوولە.

پەخشە

**پەخشەر**: بلاوکەرەوە، (باک.) بەلاڤکەر.

**پەخشەکوورە**: مێشوولە کوێرە.

**پەخشەوەدان**: بلاوکردنەوە.

**پەخش وبلاو**: پەرت وبلاو، پشاو، پەرش وبلاو.

**پەخشین**: بلاوکردن. نێوی ئافرەتانە.

**پەخشێن**: پەرتکەرەوە، بلاوکەرەوە.

**پەخمە**: پۆخاڵ، بوولە، سەپوول، فل، کەودەن، گێل، نازیرەک.

**پەڕ**: ــ ی پەرتووک، دوو لاپەڕەیە. (باک.) پەل. ــ ی باڵندان: تووکی باڵندان، پەڕوباڵ. گۆشەگیر، گۆشەنشین. کەنار و قەراخی ئاو و زەوی، بەر، گۆشە، سنوور، ئەو ــ : ئەوبەر، ئەوسەر. ئەو ــ ی زێیە: ئەوبەری زێیە، بۆ کەناری هەموو چتێک بەکاردەبرێ. ــ ی گوولێ: بەلچم، (باک.) پەلک. (زا.) پەڕ.

**پەر**: مەڕێکە سەر و شان و ملی ڕەشبێ. (زا.) پەڕ، مەڕی دەم و چاو مارۆ.

**پەڕپەڕ**: دەوراندەور، سەرانسەر.

**پەرەسوو**: پالوو، دەنکە، دەنک، کەلەکە، (کە.) دەنە، دەندە. پاراسوو، پارسوو، پارخان، (باک.) پەرانسوو، پارووخان، (ئەردە.) پەرەکە، چەند ئێسکێکی کەوانەدارە لە ڕاست و چەپی لەشی گیانداراندا سەرێکیان بەستوونی سینگەوەوئەو سەرەکەی تریشیان بە بڕبڕەی پشتێوە نووساوون.

**پەرەسووە**: ڕایەڵی زنج، دارێکە بۆ ڕایەڵی زنج ڕایەڵ دەکرێ.

**پەڕاش** (ڕۆژ.): هاڕڕاو، هاڕاو، هاڕدراو، ووردکراو، لە ئاشکراو.

**پەڕاش پەڕاش**: هاڕڕاو و ووردو خاشکراو، شکار. ــ بوون: ووردو خاشبوون.

**پەراڤ** (باک.): قەراغ ئاو، کەنار دەریا.

**پەڕاگەندە**: (ڕۆژ.) پەراگەنە. ئاوارە، دەربەدەر.

**پەڕان**: لێکرانەوە، کەرتبوون، لێفڕێدران. فڕێدانی تیپ یا ووشە لە نووسین و یا ئاخافتندا. پەڕینی وولاخان.

**پەڕانەوە**: پەڕینەوە.

**پەڕانتوو**: (باک.) پەلهوورک، بەزک. قومارە لەسەر پارە و چتی تر بە پەڕی پەڕانتوو دەکرێ.

**پەڕاندراو**: لێکراوەوە، لێبووەوە، پەڕاو، لێجوودابوونەوە.

**پەڕاندن**: لێکردنەوە، لێفڕێدان، بوواردنی چت. ــ ی وولاخ: کەڵدان، چاککردنی وولاخی نێری یەکسم لەمێینەی. ــ ی چتی توورت وناسک. ــ ی نەخۆشی: چابوونەوە، لەکۆڵبوونەوە. لەتکردن، پارچە لێفڕێدان. بڕێتییە لە ئەسپ خستنە سەر ماینی بە فاڵ، نێر خستنە سەر مێ. فڕاندن، هەڵفڕاندن، باڵدان، باڵ پێگرتن.

**پەڕاندنەوە**: لە چۆم و زێ و یا لە ڕووشە وگێچەڵان ڕزگار و قوتارکردن.

**پەڕانسوو** (باک.): پەراسوو.

**پەڕانن**: پەڕاندن. فڕاندن، هەڵفڕاندن.

**پەڕاو**: پەڕاندراو، پەڕێندراو.

**پەڕاوور**: باڵندە، باڵدار.

**پەڕاوی**: دەفتەر، (باک.) پەلدانک. ــ جگەرە: دەفتەری جغارە.

**پەڕاویدار**: دەفتەردار. ــ ی: دەفتەرداری.

**پەڕاوێز** (ڕۆژ.): (کۆ.، موک.) کۆبە، بەرکۆبە، ئەو پارچە تیلماسکەیە دووای نوشتاندنەوەی کەنارەکانی لەدیوی ژوورەوەی کەوایەوە دەدەن، کەنار و لێواری کەوایە. پەرواز، شیرازەی پەرتووکان.

**پەڕای**: ڕێز، نوودە، ڕاژە، بندەسی، پاس، پەرە، پەری، هێندایەز، نوودا.

**پەرە** (موک.، هەورا): (ڕۆژ.) پتر، تەک. زۆریە. ــ ئەستاندن: پتربوون، زۆربوون، فراوانی، تەنینەوە. ــ نەستێن: (باک.) پەنگر. پارچە، لەت، کوت. (باک.) پارە، پووڵ، دراو. گەڵای داروو درەخت وگوڵ. ڕێز. بۆ، بۆلای، سەبارەت.

**پەڕە**: ــ ی پەرتووک و قاقەز: دوو لاپەڕەیە. (هەورا.) ــ ی چاو: پیلووی چاو. ــ ئاشی: پەڕەی چەرخی ئاشی ئاوێ. (هەورا.) پەلە ئاساو. ــ ی چیکەنە: ئەو پەڕانەیە چیکەنەی دەخولێنێتەوە. پووڵەکەی پشتی ماسیانە.

**پەڕەپەڕە**: پەڕپەڕە، تووێ تووێ.

**پەرە ئەستاندن**: پەرەساندن، زۆربوون، فراوانبوون.

**پەڕە ئەستێلکە**: پەڕەسلێرکە.

**پەرە بەستن**: پەرەئەستاندن.

**پەڕڕە**: داوێنی بیابان، پەڕڕەی بیاوان.

**پەرەپا** (ئەردە.): پەڕ لەپێ.

**پەڕە جەنجەڕ**: دمە تیژو پانەکانییەتی، کە کرشە ورد دەکات.

**پەرە جۆنگ** (باک.): زۆرەوانی، شەڕ، جەنگ. (باک.) ــ ی: شەڕ و زۆرانی. ــ کرن: شەڕ و زۆرەوانێ گرتن.

**پەڕە خەڕەک**: پەڕەیەکی گەورەیە لە خەڕەکدا بە بادانی دەسکە لووجەکەی دەخولێتەوە.

**پەرەزیلە** (موک.): ئەو ماکە نەرمەیە لەسەر گوڵی دەغڵان، کە بەهۆی ویەوە ئاووس دەبێ.

**پەرەسانن** (بابا.): پەرەئەستاندن.

**پەرەسە** (کە.): ڕادە، پایە، شان، پلە. فراوانبوون، بەدەمەوەبوون، پەرەسەندن. ــ بوونەوە: بەدەمەوەچوون. پلیکان، پلە.

**پەرەسەندن**: پەرەگرتن، پەرەئەستاندن، (هەورا.) وەلابیەوە، بڵاوبوونەوە، زۆربوون. بەلاڤ بوون، تەنینەوە.

**پەرەسیان** (باک.): پینە. ــ کرن: پینەکردن.

**پەرەسیاندن**: پینە کردنی جل وچتی تر. بپەرسینە: پینەبکە.

**پەرەسیلکە**: گیایەکە وەهی گەنمی دەچێ، لەسەرسەرەوە چەند لقێکی باریکی وەکوو خەیاتەی دەردەکات، بەکوڵاوی لەنێو دەم وزاری ئێشاو بگیرێ چاکی دەکاتەوە.

**پەرەستن**: حەزلێکردن، کورنۆش بۆ بردن. خودا ــ ، کوردستان پەرستن.

**پەرەسلێرکە**: حاجی ڕەش، (باد.) هاجی ڕەشک. هەچپەچک، (زەن.) پلیسر، پەرە ئەستریلکە. (دەر.) سیپرۆسنەک، (هەورا.) پلیزگرد، (دەر. کۆ.) پەرەسێلکە، (دەر.) تسێپرووسنەک، سپیسنەک، پەرەسوورێلکە، باڵندەیێکی ڕەشی باڵ و کلک درێژە، هێندێکیان پەرگەردەنیان زەردە لە چۆلەکەی گەورەترە وتەنها لەنێو ئاوەدانییاندا دەژی و لە جێگای بڵند هێلانە دەکات، چونکو کە لەسەر زەوی بنیشێ ناتوانی بفڕێ.

**پەرەسلێنکە**: پەرەسلێرکە.

**پەرەسێلکە**: پەرەسلێرکە، باڵندەیێکی باڵ و سەر ڕەشی ژێر زگ سپی و پەرچەنە سووری کلک دوو فاقی چکۆلەیە.

**پەرەک** (باک.): ئاوی گازدار، ئاوی غازدار. (ئەردە.) ئەستێرەی سیوەیل.

**پەرەکا**: پەری کای.

**پەرەکە** (ئەردە.): پەراسوو، پەرەی چتی. پەرەی ئاشی و ئیتر.

**پەرەکەر** (هەو.): هەڵلاج، پەرەوان. کەسێکە بە کوتک و کەوان لۆکە وخوری شێ بکاتەوە. ــ ی: هەڵلاجی، پەرەوانی.

**پەرەکەی ئاسیاو**: پەرەی ئاشی. ــ قلف، ــ قوڵف: پەرەی قفلی.

**پەرەکەی کڵۆم**: پەرەی داخستن، پەرەی دەرگا کلۆمدان. ــ لووت: پەردەیێکە لە نێوانی هەردوو کە تفنکەکاندا. ــ ماسی: پوولەکەی ماسی.

**پەرەکردن**: لۆکە و خوری بەکوتک و کەوانی کارگەچییان، فش ولێک بڵاو و شێکردنەوە، هەڵلاجی کردن.

**پەرەگرتن**: پەرەسەندن.

**پەرەناو** (دزە.): لەکاتی جەنجەر یا گێرەدا قرشەی بەر پێیان هەڵدەدرێتەوە بۆ ئەوەی هەموو بکوترێ بەو کردەوەیە دەڵێن ــ .

**پەرەند** (باک.): دانە و ووردە پۆڵا. جەوەدەر بۆ تیغ. پۆڵای پاس.

**پەرەندار** (باک.): جەوهەردار.

**پەرەنگ**: (موک.) پرپرەی گوواره و گوڵ. (باک.) پۆلوو، بزۆتی ئاوور.

**پەرەنیشک**: گیای نووسەنەک. پەنێرشک.

**پەرەوازە**: پەروازە. هەڵچوون و گەورە بوونی منداڵ و مەل. بێچووە باڵندان، کە تازە وازی بە باڵیان دەکەن بۆ ئەوەی فێری فڕینێ ببن ــ ی پێدەڵێن. پەروازە. چاکتربوونەوەی بار. دەربەدەر، پەرێشان. ــ بوون: باڵگرتن. دەربەدەربوون، دوورکەوتنەوە. ــ کردن: دەربەدەرکردن. فڕاندن.

**پەرەوور** (خۆ.، هەو.): باڵندە، فڕین، باڵدار، پەرەوول.

**پەرەوگوڵ** (هەورا.): پەری گوڵان.

**پەرەوێراو** (هەورا.): بسەپێراو.

**پەرەی** (باجە.): پێرێ.

**پەرپازی**: باڵندەیێکە بەدەوری چتێکیدا بێت وبچێت وگەمە بە باڵی خۆی بکات یا خۆی فێرە فڕین بکات. گەمەیەکیشە بە باڵی باڵندان دەکرێت. بە مەبەستی شۆخی و نازیش هاتووە.

**پەرپوون**: دەرکەناربوون، گۆشە گیربوونی یەکێک.

**پەرپووت**: مرۆڤێکی پەرپووت و نابووت و چکۆلەیە، شەر و شەڕۆڵ، جوو قلی، جووڕەپۆتە، شەوخەپیە. مرۆڤۆک. چتی کۆن و ڕزیو. پەرتووکی کۆن و دڕاو وپەرپەر. جوورە مراوییێکیشە.

**پەرپەرۆچکە**: پەرپەرۆچکە. ــ ی ئاسمانێ: پەرپەرۆچکەی کەشکەلانێ.

**پەرپەرۆک** (باد.): پەپوولە.

**پەرپەریک** (باک.): پەپوولە.

**پەرپەتاندن**: پیچدان، تاودان.

**پەرپەتین** (باک.): خەم و تاوو پیچ بوون. ڕووتاندنەوەی پەری باڵندان. بپەرپەتە.

**پەرپۆت** (فە.): ئاوەڕووت. ــ کردن: ئاوەڕووت کردن.

**پەرپووت**: شڕو وڕ، نابووت، دڕاو، پووچ بووەوە.

**پەرپوولە** (دەر.): پەپوولە.

**پەرپێتاندن**: پەرپەتین.

**پەرپێنە** (سوور.): پەڵپێنە، پرپرە (گیایەکە).

**پەرت**: پەخش، بڵاو، پەرش، پەرێشان. ئاشکرابوون. ــ بوون: پەخش بوون، ئاشکرابوون. ــ کردن: بڵاوکردن، ئاشکراکردن. فڕێدان. هەڵە، چەوت، نادروست، ناڕێک.

**پەرتاف** (باک.): تا، نۆبەتێ. ڕووناکی، تیشک، ڕۆشنی.

**پەرتال** (باک.): چەخەر، شوێن، ئەنجام، هەدرەش. (باک.) کووتاڵ.

**پەرتان**: تووک ڕنان، لە نێوبران.

**پەرتاندن** (باک.): تووک ڕنینەوە، ئاوەڕووتکردن، پەرکردن. بپەرتێنە: بڕوتێنەوە، لەناوبردن، پارچە پارچەکردن.

**پەرتەنێکەوتن**: بڵاوبوونەوە، پەرت بوون.

**پەرتەو**: پەرتاف، ڕووناکی، ڕۆناهی، پەرتەو پاشای هەکاری باپیری هەستیاری کورد عبدالرحیم رحمان پەرتەوە، کە لە پێش چەند ساڵاندا لە ئەستەنبووڵی کۆچی کردووە و دیوانەکەشی هەر لەوێ چاپکراوە.

**پەرتەوازە**: پەرەوازە، ئاوارە.

**پەرت بەستن**: پەرت بوون.

**پەرتدان**: فڕێدان، تووڕهەڵدان، هەوادان.

**پەرت سێنی**: کڕینی بێ جێ، وێڵ خەرجی.

**پەرتگا:** شوێنی بڵاو و ئاشکراکردن، هەڵمەت. تووش، لێژایی، خزگە.

**پەرتگە:** پەرتگا.

**پەرت وبڵاو:** پەخش وبڵاو، داخان. ـــ کردن: داغانکردن.

**پەرتووک:** کتێب.

**پەرتووکان:** داڕزان، لەناوچوون.

**پەرتووکاندن:** داڕزاندن، لە ناوچوواندن.

**پەرتووکخانە:** نامەخانە.

**پەرتووک وورەش** (هەورا.): پەرتووکفرۆش.

**پەرت وێژی:** وێڵ وێژی، ئاخۆتنی بێ جێ.

**پەرتی** (باک.): پرتک، بڵاوی. خاوەندی بەرگی دڕاو و پرتک.

**پەرتیات:** پەرتەمەنی، بڵاوکراوە.

**پەرتین** (باک.): تووک وپەڕ لێبوونەوە، خوری لێبوونەوە.

**پەرجان** (گەر.، باد.): چیلە، پەرژینی ڕەز و باخ وهی هەرچتێکی بێ.

**پەرچ:** بێشە. چەمچخوور. (هەورا.) پەرژینێکە هەموولایەکی بە دارەدرکی شێن ڕازابێتەوە، پەرچین. مێوێک یا چەند مێوێکی گەورەیە، کە ڕێک و پڕ پاڵبدەنە یەک. (کۆ.) شوێنێکی پڕ درک وداڵ و گیاو دارەمێوی تێکچڕژابێ. (زەن.) چڕ، قاڕوون، زەمەند. (کۆ.) مێوێکە بخزێتە سەر قایەو نەبێتە کۆلکە. (ڕۆژ.) وەڵام. (هەورا.) داڵێت. بەهانە، بیانوو، بیانک. (موک.) نالبەند و دارتاش و ئیتر، کە بزماری لە هەر شوێنێکی بکوتن کە سەر نووکەکەی بکوتنەوەو پانی بکەنەوە پێی دەڵێن ـــ دانەوە. کیپ، کپ، گیراو. کونی لوولێنە و مەسینە و ئیتر، کە بە خشت وخاڵ و چرپ و چاڵ بگیرێ و ئاوی لێ نەیەت دەڵێن ـــ بووە. ـــ کردن: گرتن، بەستن. سەرپەلی داری بەند کە قر مابێ. پەچ. پەرژین.

**پەرچان:** پان بوونەوە، بان بوونەوە. (باد.) پەرژین.

**پەرچاندن:** پەرچاندنەوە.

**پەرچاندنەوە:** سەری بزمار و ئیتر پان کردنەوە ونووشتاندنەوە، پەرچدانەوە. داپاچاندنەوە.

**پەرچانن:** پەرچاندن.

**پەرچاوە:** پەرچدراو.

**پەرچاوتن:** بەبەرهەڵستی جۆگەیەکی دەڵێن، کە بە پەرژین و داران ڕێکخرێ تا ئاوی لە نزمیەوە بەرزکاتەوەو وە سەری خات.

**پەرچە:** (بان.، ئالا.) پەچە، هەوێر، حەوشەی ئاژەڵان. گیایەکیشە. (باک.) پارچە، لەتکە، کوت، پارچەیێکی گچکە.

**پەرچەم:** پیچووکە، تووکی کورتکراوەوەی سەر ڕوو، کە بەقەف ڕادەوەستێ، بەرچاوگە، مووی ناوچەوان، کە بە مەقسەت خشت کرابێ بۆ جووانی. (هەورا.) پێچە، ڕووبەند.

**پەرچدان:** پەرچدانەوە، سەری بزمار پانکردنەوە.

**پەرچدانەوە:** نوشتاندنەوەی لووتی بزمار لەدیوی ئاوەوە. بەرپەرچدانەوە، ڕاقە، پەرچاندن.

**پەرچفاندن** (باک.): باپێکردن. هەڵامساندن.

**پەرچفین** (باک.): باکردن، ئاوەسان، هەڵامسان.

پەرتووک

پەرتووکخانە

**پەرچڤاندن** (باک.): هاڕین، ووردوخاشکردن، پامال، پایەماڵکردن. قەڵەشتن، قەڵەشاندنی دار و ئیتر. بپەرچڤینە: ووردوخاشی کە.

**پەرچڤین** (باک.): ووردوخاشبوون، قەڵشین. قەڵشان.

**پەرچی:** هیچ وپووچ، هەرچی و پەرچی.

**پەرچین** (هەورا.): پەرژین. (هەورا.) ـــ کرن: پەرژین کردن.

**پەرخ:** شێلان و بە دەست ماڵین.

**پەرخاش:** ئاڵۆزی، شەڕ، کێشە.

**پەرخاندن** (بار.): گەوزاندن، خاراندن. پڵیخاندنەوە، تێکدان. بەناو ساڵاندا چوون، سەربوون.

**پەرخین:** هەڵگەڕان، خراپبوون، پڵیخانەوە. ووشترخان دروستکردن. بەناو ساڵاندا چوون، سەربوون.

**پەردا:** تەوەقە، تەبەقەی قاقەز و ئیتر. تا، تاک، لنگە.

**پەرداخ:** ئامادە، گورج، توندوتۆڵ، گورج وگۆڵ، کۆک و پۆشتە، ڕێک وپێک. (خۆ.) قیسپ وشەقرە وچرووی خانووان. (شار.، جا.) پەردوو. (موک.) قاقەزی ـــ: قاقەزی سمپارەیە، قاقەزێکە ڕوویێکی زبرە ئاسن و داری پێ دەرنرێ. بەرداغ، کاسەی ئاوی، تروسکە، شۆق، مشت و ماڵ.

**پەرداخدار:** تروسکەدار، شۆقدار. ـــ ی: تروسکەداری.

**پەرداخکردن:** ئامادە و توند وتۆڵکردن. لووسکردن و ڕێک وپێک کردنی چتێک. ژەنگ لابردن، پاک کردنەوە. تروسکەدارکردن، مشت و ماڵکردن.

**پەرداخی:** توند و تۆڵی، گورجی، ئازایی، تەڕدەستی.

**پەردار:** باڵندە، باڵدار، پەرندە، پەڕەوور، پەڕاوور.

**پەرداغ:** پەرداخ. کاسەی ئاوی.

**پەرداغکردن:** ئامادە و توند وتۆڵکردن.

**پەردان** (زەن.): فڕێدان، لابردن.

**پەردە:** کەمەرچین، کەتان، پۆشار، سەرووک، کەز. چارشەف، پەیە، (باک.) چارچەف. هجال. چتێکە لە کوتاڵ، کە رووکاری چتێکی بگرێ وەکوو ـــ ی دەرگا، ـــ ی پەنجەرە، پەردەی دیوار و ئیتر. ـــ ی سینەما. ـــ ی گۆرانی، نەزم وچەشنی مەقام. ـــ ی شایلۆغان: پەردەی مۆسیقا. ـــ ی بووکێ. ـــ ژنان: چارشێوو ڕووبەند. ـــ ی گەمێ: (باک.) ئەیاسێ. سەرپۆش. تووێی چت: پیواز پەردەپەردەیە. پەڕی قاقەز، تەبەقە.

**پەردەباز** (دەر.): پردەباز، بەردەباز.

**پەردە پەردە:** تووێ تووێ، پەردە بە شوێن پەردەدا.

**پەردەپڵاو:** جوورە پڵاوێکە پڕ لە کشمیش و بادەم و کفتەی وورد لەناو قاپێکی مسینی قووڵی تایبەتیدا دادەچێنرێ و پەردەیەکی لە هەویری بۆ دەکرێ.

**پەردەدار:** کەسێکە ئاگای لەپەردەبێ، پەردەوان، واتا هەڵدانەوە و دادانەوەی پەردە لە ئەستۆی وی بێ. تیغەدار. ـــ ی: پیشەی کەسێکیە، کە ئاگاداری پەردەی دەکات لە بابەت هەڵدانەوە و دادانەوەی. تیغەداری.

**پەردەدڕان:** مەبەس لە ئاشکرابوونی ڕازێکی نهێنییە.

**پەردەدڕی:** پەردە دڕاندن. ڕاز و چتی نهێنی ئاشکراکردن.

**پەردەک:** مەتەڵ.

**پەردەگیر:** زاوایەکە، کە لە پەردەی زاوایەتیدا بمرێ یا نەخۆشکەوێ.

**پەردە لە رووهەڵاوێژتن:** شەرم لادان.

**پەردەناس:** شارەزای پەردەی گۆرانی و مۆزیقە.

**پەردەناسی:** نەزم زانین.

**پەردەنشین:** بەشێواز، پاک، شێوازدار.

**پەردەنشینی:** بەشێوازی، پاکی، شێوازداری.

**پەردەهەڵگرتن:** ئاشکراکردن، ڤەوراندن.

**پەردەی بەیلخ:** ئالا، بەیداخ، پەردەی ئالا.

**پەردەی دەروازە:** سەرا پەردە.

**پەردەی زگ:** پەردەی سک.

**پەردەی ژێر پۆس:** پەردەی ژێر پێست.

**پەردەی ساز:** مەقام.

**پەردەی کەت:** پەردەیێکە بە گرداگردی تەختی خەوێیدا دەگرنەوە.

**پەردەی لووت:** پەردەیێکە لە نێوانی دوو تفنکەکانی کەپۆ دایە.

**پەردەی منالّ:** پەردەی منداڵ، ئاوالمنداڵ.

**پەردەی وەوی:** پەردەی بووکێ.

**پەردەیی:** ئافرەتێکە هەمیشە لە پەردەدابێ و نەیەتە دەرەوە. پەردەنشین.

**پەردز:** ووچان، دەرفەت، لە دەست هاتن.

**پەردوو** (جا.، ش.): هەلاش، ئالاش، (خۆ.) بەرداخ. داروبەردو هەلاش و شڕوشالاتی سەربانان، زەل و هەلاشێکە، کە لەسەر دارەڕاوە دادەنرێ دووایە گڵە بانی لەسەر دەکرێ.

**پەردووخیان:** پەردۆخیاگ: هەڵپرووزان.

**پەردۆخیان:** هەڵپرووزان، نیوە برژان، نیوە برژ، نیوە سووتان.

**پەرزەوان** (هەورا.): شیرپالۆک، پالووێنە.

**پەرزنە** (هەورا.): پالووێنە.

**پەرزارە** (کرما.): بیر، کەڵکەڵە.

**پەرژان:** هاتنەسەرخۆ، لەدەستهاتن، پێکران، کاتبوون، دەرفەت دەستکەوتن بۆ کردنی کارێک یا چوونی شوێنێک، پەرژیان. (خۆ.، رەوا.) پەرژین.

**پەرژوبلاو:** پەرش وبلاو، پرش وبلاو، پشاو.

**پەرژیان:** پەرژان.

**پەرژین:** دیواری ماڵ و حەوشەی گوندی یان هی باخ و باخچانە، کە لە دار و شوولک دەتەنرێ. (خۆ.، رەوا.) پەرژان. (کۆ.) چیلە. تانۆک، تان. (باک.) تەیان، پەرجان. پشتیوان، پارێزگار، رازپۆش: تۆ بۆ من ـــ ی.

**پەرس** (هەورا.): پرس، پەرست، پەرستندە.

**پەرسار:** نەخۆشەوان. نۆکەر، خویدار.

**پەرساری:** نەخۆشەوانی. نۆکەری، خووێداری.

**پەرسە** (هەورا.): سەرەخۆشی، پرسە.

**پەرسێن:** گیایەکە بەرزێیک بڵند دەبێ گوڵی بەهێشوو و سپی یە.

**پەرستراو:** خودا، خولا، یەزەتە، یەزدان، ئێزەد.

**پەرستش:** پەرستن.

**پەرستگا:** پەرستگە، دێوەڵ.

**پەرستگە:** پەرستگا، دێوەڵ.

**پەرستن:** خودا پەرستن، گەل و نیشتمان پەرستن. خۆ ـــ.

**پەرسوونە:** پەری کلکی سۆنەی.

**پەرسیاوەش:** پەرسیاوەحش، گیایەکە لاسک رێک وتەڵخ رەنگە، گەڵای وورده، تامی تاڵە ئەسیدگالیک وئەسیدتانیکی تێدایە (٢٠)ی وی لە ١٠٠٠ ئاودا بکوڵێ بۆ پەسیو زۆر باشە.

**پەرسیف** (باک.): هەلامەت، پەسیو.

**پەرسیلە** (بابا.): قۆرە.

**پەرسین:** پەرستن.

**پەرسێو** (سور.): هەلامەت.

**پەرش:** جوورە دەغلێکی سەوزە بەر وێشی لێ پەیدادەبێ. بەرووبووی کوێستانییە.

**پەرش:** بلاو، پەراگەندە، پەخش. ـــ و بلاو: پەرت وبلاو. ـــ بوون: (باک.) پەرشلین. ـــ کردن: پەرشلاندن، (باک.) پەشاندن. پەڕین، پەروانە. جوورە دەغلێکی تایبەتی یە وەکوو گەنمی سوور وایە بەلام لە چەلتووک و پۆرگدایە وەکوو ساوار لێدەکرێ و چەند جوورە چێشتێکی لێ دروست دەکرێ تامی پلاوی برێشی لەگەڵ ساوار و برنجی وەکوو ئاسمان و رێسمان وایە، کە لێکرا برێشی پێ دەڵێن.

**پەرشە:** پەرش.

**پەرشت:** پەرش، پەرشە.

**پەرشتین:** چێشتی پەرش.

**پەرش وبلاو:** پەرت وبلاو.

**پەرفین** (باک.): خۆناسین، شەیتان پێ پێکەنین.

**پەرڤۆنە** (هەورا.): پەروانە، پەپوولە.

**پەرک** (باک.): پەرتووکی چکۆڵە.

**پەرکال** (زا.): بریقە و رێک وپێکی چتێک.

**پەرکەم** (خۆ.، رۆژ.، کۆ.، شار.): خوو، فێ، گەشکە، دەردەکۆیانە، نەخۆشییێکە، کە منداڵ بیگرێ لە هۆشی خۆی دەچێ، بۆ ناراڵ پێیدەڵێن سایە. مەرگی کوت وپڕ.

**پەرکۆڵول:** مەری دەم و چاوو ومل رەشی سەرلووت سپییە.

**پەرکێشیاگ:** باڵندەی پەرکێشراو.

**پەرگ** (رۆژ.، شار، دەر.): بەنێکی کشتە بۆ کەلاش چنینی سەری کەلاشی پێدەچێنرێ بەشیرازەکەیەوە. دەزوو، بەن. (باک.) فێرک.

**پەرگار:** مرازێکی دوو قۆڵە خەتی خڕ و کەوانەداری پێدەکێشرێ. (باک.) پەرگال.

**پەرگاری ئەندازە:** پەرگارێکە بۆ ئەندازە گرتنی ئەندازیاران دەست دەدات.

**پەرگال** (باک.): ماڵ، بنەماڵە، خانەوادە. بار.

**پەرگە:** (دەر.) بەنی ئامادەو کشتە بۆ کەلاش چنینێ. (دەر.) پەرگ. (بابا.) کەناری کەلاشی چنراوە، لای پەنجە و دەوروبەری

کەلاش، کە چنرابێ. (موک.) کەنارگە، جێگای کلا، پەناگە. لا ــ: سەرپەرگە، سەرپەڕ.

**پەرگەما:** دەزووی بنەڕەتی کەلاشانە، کە لەسەروی یەوە پەرگ دەچنرێ، برێتی یە لەو ڕیزە چنینەی لە سەر تەختی ژێر کەلاش بەدەورەی ژێرەکەیدا دانراوە لە سەر ئەو دەورە دەکرێت بەچنینی کەلاش بە پەرگ واتە سەری کەلاش بەبنەکەیەوە دەدروون.

**پەرگەنە** (ڕۆژ.): پەراگەندە.

**پەرگهاندن** (باک.): کۆکردنەوە. بپەرگهێنە: کۆکەوە.

**پەرگهین** (باک.): کۆبوونەوە.

**پەرگی** (باک.): تووشی یەکتری بوون. ــ بوون: دیدەنی یەکتری کردن.

**پەرلەمان:** جڤاتی نوێنەران.

**پەرلەپێ:** جوورە کۆترێکە هەردووک لاقەکانی پەڕ داپۆشیون.

**پەرموون** (بابا.): لەخۆڕادیتن. لەخۆڕابینین.

**پەرموونەوە:** هیوای لێ وەشانەوەی چتێکی چاک یا خراپ لە یەکێک: پێی دەپەرمووموەوە یا ناپەرمووموەوە بۆ کردنی ئەوکارە. کۆکردن و سڵەمینەوە لە چتێک: فیسارەکەس لە هیچ ناپەرمووێتەوە.

**پەرمیان** (ئەردە.): دڵنیایی، باوەڕ، چاوەڕێیی.

**پەرنە:** پەرندە، مەل، پەلەوور، مر، پەلەوەر.

**پەرندە:** باڵندە، باڵدار، پەرەوور، پەراوور، پەلەوور.

**پەرنساندن** (باک.): بووژاندنەوە. چارەکرنی ئاتاجی و بەد بەختێتی.

**پەرنسین:** بووژانەوە.

**پەرنیان:** پارچەیێکی جوان و ناسکە.

**پەڕۆ:** پەڕۆک، پەڕۆکۆنە، کۆنە پەڕۆ، پاتە، پاچک، کالای کۆن وشڕ، شڕە.

**پەروو:** دیاری. کالایەکە ببەخشرێ.

**پەروا** (باک.): ترس، کێمخوا؛ پەروام لە کەس نیە: باکم لە کەس نیە. بێ ــ: بێ باک، شیرباز، گوهفرە.

**پەروار:** دابەستە (ئاژاڵ یا مالات)، دابەستیاگ، دابەسیاگ.

**پەرواری:** دابەستە (ئاژاڵ یا مالات).

**پەرواز:** چووار چێوەی ناسک هی وێنە و نەخشە و ئیتر. ــ کردن: فڕین، باڵگرتن، پەرش. فڕینی باڵندە، باڵگرتن، پەرش.

**پەروازە:** گەورەبوون، هەڵچوون. پەرەوازە، باڵگرتن.

**پەروازەبوون:** پەرەوازەبوون.

**پەروانە:** فرفرە. ــ ی ماکینان. پەپوولە. ــ بۆ هەموو چتێک بەکار دەبرێ، کە بە گەوی چەرخێکیدا بسوورێتەوە وەکوو ــ ی پانکە، پەروانەی ئاشی، ــ ی کاتژمێری.

پەروانە

**پەروانەی کەژمێر:** پەرە و پەروانەی کاتژمێران.

**پەروە:** خەلات، شاباش، بەخشش. ــ ی کرد: بەخشش وخەلاتی کرد.

**پەروەر:** پەروەندە: خۆشویستەر. ئەڤیندار، نەتەوە پەروەر، گەل پەروەر، وولات پەروەر. حەز لێکەر.

**پەروەردە:** بەخێوکراو، ڕەنێوهێنراو، گیاندار و یا هەر جوورە ڕووەکێک و ئیتر، کە بەرەنج وکۆشش بەرهەم هێنرابێ. بەناو هاووریاگ.

**پەروەردەبوون:** پێگەیشتن، بەخێوبوون، بەرێچوون، بەرهەم هاتن، بەناو هاووریان.

**پەروەردەکەردەی:** گەورەکردن، بەخێوکردن، پێگەیاندن، پێراگەیاندن، ڕەنێوهێنان، بەرێبردن، ڕاگرتن، پەروەردەکردن.

**پەروەردەکردن:** پەروەردەکەردەی، بەخێوکردن، پێگەیاندن، پێراگەیاندن، ڕەنێوهێنان، بەرێ بردن، ڕاگرتن، بەرهەم هێنان، بەناو هاووردن.

**پەروەردگار:** خودا، یەزدان، ئاهورامەزدا، خولا، خوواوەند، ئافەریننده، زەردەشت، یەکێکە لە ناوەکانی خودا، زەرتوشت.

**پەروەرش:** پەروەردەکردن.

**پەروەری:** پەروەرندە. مامۆستای بەرهەمهێنان.

**پەڕوباڵ:** تووک و پەڕوباڵ.

**پەڕووپاڵ:** کووماتک.

**پەڕوو پۆ:** پەڵوپۆ، سامان، دەوڵەت، تین. لە ــ کەوتن: لەهێز کەوتن، بە هەژاری داکەوتن.

**پەڕووپووت:** پڕووپووش، قانگەلاشک، حاجی دەفەرمووێ: منیش کاتێ دەزانی پێم هەڵە نگووت ئەجەل بای سەر سەرە ئێمەش پەڕووپووت.

**پەڕووپێ** (باک.): منداڵی چکۆڵە، بەبە.

**پەرۆش:** پەژارە، دەرد، جخار، خەفەت، (باک.) ئاهین، ئاهێن، حەیف، جەخار، سۆ، سووێ، داخ، پەکوو، خەم، کزی، ئاخ، کوڵار، (باک.) ئالووس، پووشکوول. هەژمەت، حەچمەت، دڵگری، (خۆ.) تاوان، دلمایی، شڕوو، کۆڤان، کووڤان، پەرێشانی، سە خڵەتی دڵ. ــ بە خوواردن: سوولی بوونەوە، دەست بەئەژنۆی خۆدادان، خەمخواردن. بە ــ: خەمخۆر، خەمگین، کز، (باک.) برەش. بێ ــ: (باک.) سەرگندان. نێوی نێرینانە.

**پەرۆشە:** پەڵۆشە.

**پەرۆش دڵ** (باک.): دڵ بەپەرۆش.

**پەرۆشدار:** خەمگین، شالی، کووڤاندار، کز، کۆڤاندار، کوولک، ئەجین، کووڵۆڤان، دامار، خدۆک، خەمخۆر، (باک.) بڕەس، دڵگە، بێنافسۆک. ــ ی: خەمباری.

**پەڕۆک:** پەڕۆ، پەڕۆکۆتە.

**پەڕۆکەردەی** (هەورا.): پەڕۆکردن.

**پەڕۆکردن:** پینەکردن، بیرازکردن.

**پەڕۆکفرۆش:** کووتاڵفرۆش، گەزفرۆش. ــ ی: کووتاڵفرۆشی.

**پەڕۆکۆنە:** پەڕۆ، شڕە، کۆنە، کۆنکە.

**پەڕۆی** (لو.): پان، بەرین.

**پەڕۆی بێ نوێژی:** شەڵە، شرنکە.

**پەڕۆی زەخم:** برین پێچ (پەڕۆ).

**پەڕۆی گەرم** (هەورا.): نیوەغەک.

**پەرویز:** سەرکەوتوو، پیرۆزی دەستکەوتوو. ناوی نێرینانە.

**پەروین:** کۆ، پیرۆو، جار. چەند ئەستێرەیەکی گچکەن لە هەوادا لە شوێنێکیدا کۆبوونەوە و بەقەوارە وشکلی ئەستێرەیەکی دەبینرێن بە ناوەوی (ثریا) یە. نێوی کچانە.

**پەرهام:** پەراهام، برایم، برام، ئیبراهیم.

**پەرهیز:** پارێز. ــ کردن: پارێز کردن.

**پەرهیزگار:** کەسێکە هەمیشە لەکاروباری خۆیدا بە پارێز و ووشیار بێ. خودا، خووا، ئێزەد. ــ ی: پارێز.

**پەرهێزی:** پارێزکردن.

**پەری:** (موک.) زەری، فرشتە. ــ ئەندام: ناسک بەدەن. ــ پەیکەر: ناسک بەدەن. ــ ڕوو: ڕوو زۆر جوان. ــ ڕوخسار: ڕوو زۆر جوان. (هەورا.) لەگەڵ، لەتەک، بەیەکەوە. (فە.) بۆ، لۆ، ئەڕا. (باک.) بژی گوڵی دەخڵ و دانان. پەڕی باڵندان. (باد.) پەردەی زلوا. ڕیز، نوودە.

**پەڕێ:** (جەبا.) بۆ، لۆ، پەری، ئەڕا. ــ تۆم هێناوە: بۆ تۆم هێناوە. (هەورا.) پیرێ. (هەورا. کۆن) بۆ، لۆ. (هەورا. تازە) پیرێ، پیر.

**پەڕی باڵارا** (هەورا.): پەڕی باڵندان.

**پەری بڕ:** کوڕێکە، کە زگماک چەرمی چووی نەبێ.

**پەریتانگ** (باک.): پەپوولە.

پەریتانک

**پەریجار** (باک.): گەلێجار، زۆر جاران.

**پەریجان:** ناوی ئافرەتانە.

**پەریخان:** شازادەی پەریان. پادشایی پەر یان.

**پەریڕەش** (باک.): جوورە گەنێکە.

**پەریڕەشک** (باک.): شەیتان.

**پەریڕوو:** پەری ڕوخسار، جوان، زەری، نێوی ئافرەتانە.

**پەریز** (هۆر.): نەردیوان.

**پەرێز:** زەوییەکە دەغڵی لێ درووابێتەوە تەنها بنی لاسکی دەغڵەکە بەقەد بستێک یا قولانجێکی لە زەوی دا مابێتەوە، قەرێز. (باک.) بسام، پرێزە. جار. پارێزگە، بۆسە.

**پەریزاد:** نێوی ئافرەتانە.

**پەریزادە:** خاتوون، ناسک، لە پەریان بووە. جوان وشۆخ و شەنگ.

**پەری ژیان:** ژیانێکی خۆش وەکوو زیندەگانی پەریان.

**پەریسار:** چەشنی پەری، وەکوو پەریان.

**پەرێش:** پەشێو، پەرێشان.

**پەریشان:** شان وپایە وەکوو پەریان، شێخ ئەحمەد جزیری دەڵێ: پەریشانم پەریشان.

**پەرێشان:** بڵاو، پەراگەندە، ئاوارە، داوداو، تاتا، پەرێش، پەشێو، پڕاش. خەمناک، بەدبەخت، چارەڕەش، لێ قەوماو، دەستە پارچە، گردەنشین، ڕەت بڵاو، خاکەسار، خاک بەسەر، (باک.) کۆڵەوار، پۆشمان، پەلیشان، کەیل، کارتێکچوو، هەژار، بۆژە، بۆژما، ناکۆک، شێواو، پەژارە، شپرزە، بێ پەرگال، بێ قرام، بێ ئاپۆر. ژوولیاگ، پەژێو، پەرێش. ــ بوون: شێوان، فەلشین، پەلیشین، تێکچوون، چارەڕەش وکلۆڵبوون. ــ کردن: پەلیشاندن، فەلشاندن. چارەڕەش وکلۆڵکردن، شێواندن. ناوی نێرینانە. ــ ی: شێواوی، پەژارەیی، خاکەسەری. (هەورا.) ئاشەف.

خاک بەسەری، خەمناکی، بەدبەختی، چارەڕەشی، لێ قەوماوی، شپرزەیی.

**پەرێکە:** پیر، پیرێ.

**پەریگەردن:** ئافرەتێکە گەردنی وە گەردنی پەریان بچێ.

**پەریمێرگ** (باک.): شەیتان، پەری ڕەشک. گیان.

**پەڕین:** چتی توورت وناسک، کە پارچەی لێبێتەوە دەڵێن پەڕی، پەڕین چاوگەکەیەتی. جووت بوون، گانکردن، لێهاتن، بۆ ئەسپ و نێرەکەر و سەگی بەکاردەبرێت، سوواربوونی نێر لە مێ، کێشان و ترازان و دەرچوونی چت لە جێی خۆی، لە گۆچوونی ئەندام بەهۆی سەرماوە. بازبردن، بازدان، قەڵەمبازدان. باڵگرتن، فڕین. هەڵگەڕانی شیر.

**پەریناز:** نێوی ئافرەتانە.

**پەڕینە خووارەوە:** دابەزین، داوەزین.

**پەڕێنەر:** لێ فڕێدەر، لێکەرەوە. گانکەر، گان پێکەر.

**پەڕینەقورگ:** دڵکەفتن، پەڕینە گەروو.

**پەڕینە کۆڵ:** سوواربوون.

**پەڕینەوە:** تێپەڕین بەسەر ئاورێکیدا، ڕۆیشتن. لە ڕووشە و گێچەڵ ڕزگار بوون. بازدان، بازبردن، پەڕین. ووشکبوون.

**پەڕێندراو:** وولاخێکی نێرە، کە سوواری مێیینەی چەشنی خۆی کرابێ. پەڕێنراو.

**پەڕێنراو:** پەڕێندراو.

**پەڕیوەی هەندەران:** دەربەدەر، ئاوارە.

**پەڕیو:** وولاخێکی نێرەیە، کە سوواری مێیینە بووبێ. لێکراوەوە، فڕێدراو.

**پەڕیویت:** (ژاوە.، هەورا.) بۆ تۆ، سەبارەت بەتۆ. بۆ خۆت، (هەورا.) پەێویت. (دەر.) ڕاخووەت.

**پەز** (باک.): ئاژەڵی بچووکە بە مەڕ و بزنی دەڵێن، مێگەل. لە هەندەک شووێناندا بە مەڕیش دەڵێن. جوورەکانی بزن و مەڕ لە شێوەزاری شارەزووردا: (باک.) پەزێ ڕەش: بزن. (باک.) پەزێ بزن: بزن. پەزێ سپی، پەزێ مێشینی (باک.): مەڕ. پەزێ چاڤ ڕەش: جوورە مەڕێکە. پەزی سۆر: جوورە مەڕێکە. پەزی زۆزان: مەڕی کێوی. پەزێ بەرازی: جوورە مەڕێکە.

**پەزان** (ڕۆژ.): بەزین، بەرگە نەگرتن، بەرانبەری پێنەکران.

**پەزاندن** (ڕۆژ.): بەزاندن، بەسەردا زاڵبوون.

**پەزانن** (ئەردە.): لێنان، کوڵاندن.

**پەزاو:** دووئاو، ئاودانی شەتڵە بۆ جاری دووەم.

**پەزەکێفی:** بزنە کێوی.

**پەزکۆڤ:** بزنەکێوی.

**پەزوودان** (باک.): تاریک و ڕوونی بەیانی. بەیانی زوو.

**پەزیا** (فە.): کوڵاو.

**پەزیان** (ئەردە.): کوڵان.

**پەزیو** (فە.): لێنراو، چێشت، کوڵاو، (فە.) پەزیا.

**پەزێ بەرازی** (باک.): پەزی چاڤڕەش.

**پەزی چاڤرەش** (باک.): پەزی ڤەرگاش، پەزی بەرازی، جوورە مەڕێکە.
**پەزیرایی** (هەورا.): ڕێزگرتن، نووده و پەراییگرتن.
**پەزێرە**: شەومانده، شەومەنە، پەسمەنە. چێشتی کۆن، پەسێرە، چێشتی ماوەوەی شەوێ.
**پەزیزانگ** (باک.): چیکڵدانە و سیقەتۆرەی کەڵەشێر.
**پەزیشک**: پزیشک.
**پەزیشکە**: کونجرکە، قونجرکە، نووسەکە، کە بە جلکەوە دەنووسێ.
**پەزی ڤەرگاش** (باک.): پەزی چاڤ ڕەش، جوورە مەڕێکە.
**پەزین** (ئەردە.): کولاّن، لێنران. کولاّندن، لێنان.
**پەزیو** (ڕۆژ.): بەزیو. (ئەردە.) لێنراو.
**پەژ** (باک.): لق و پۆپی داران.
**پەژاچ** (باک.): مامان. (باک.) ـــ ی: مامانی.
**پەژارە** (هەورا.، جەبا.، فە.): خەفەت، خەم، پەرۆش، ئەنوو، پۆکەپۆک بۆ چتێک. بیر، هۆش.
**پەژەڵ** (باک.): درک وداڵ، لکی شکاو.
**پەژچاندن** (باک.): هەڵبەزاندن، هەلقولاّندن.
**پەژراندن** (باد.): بەپیرەوەچوون.
**پەژڤا** (باک.): هاندەر، فیتدەر.
**پەژقاندن** (باک.): پێ هەلقوڕاندن. بپەژقینە: پێی هەڵقوڕێنە.
**پەژقین** (باک.): هەڵقوڕاندن. بپەژقە: هەڵقوڕێنە.
**پەژک**: دەستە چیلەی ئاوور.
**پەژلاندن** (باک.): گەڵای داران هەڵگرتنەوە. بپەژلینە: گەڵای داران هەڵگرەوە.
**پەژلانۆک** (باک.): دەرمانی بەر، داروویی گەرماوێ.
**پەژم** (هەورا.): خوری.
**پەژمردە**: پەژمووردە.
**پەژمووردە**: پەژمرده. گیان لەبەر و یا گوڵ و شیناوەردی، کە چرچ و ژاکاو و سیس و کز بێ، ژکیاگ. پەشێو، خەمگین، تەمین، خەمبار.
**پەژمینە** (ئەردە.): کەرەکیفە، کەرەوولّ، کەروو.
**پەژن** (باک.): تەقە، ڕەقە، دەنگ. ـــ کرن: تەقەکردن.
**پەژنک** (باک.): لکی گچکەی داری ووشکە.
**پەژیراندن**: ویستن، هەڵگرتن.
**پەژیک** (باک.): خەلف، لکە داری یەکسالاّنەیە.
**پەژینە** (ئەردە.): کەرەکیفە، کەرەوول.
**پەژێو** (ئەردە.): پەشێو.
**پەژیوان**: پەشیمان. ـــ ی: پەشیمانی.
**پەس**: ئیتر، ئەمجا، ئەوجا. (لو.، فە.) نزم، پەست، چاڵ، نشێو. گچکە، بێ ناو، سووک. (زەن.) مەڕ.
**پەسا**: پێ خوویّ یەک قوڕ بۆ سواغ کردن. کەرەستەی دۆڵمە و ئیتر.
**پەساپەس**: پەساپەسا، پەیاپەی، پەیتاپەیتا، یەک لە دووی یەکتری.
**پەساپۆرت**: ودمنایەکە وەردەگیرێ لە دەوڵەت بۆ ئەوەی بە ئازادی هاتوو چۆی وولاّتانی بێگانان بکرێ.
**پەساخوڕ** (ئەردە.): پاشاخوڕ.
**پەسار** (باک.): بەندەر، پەسارگە، میناى دەریا، ڕێگای بەردچن لە کەنارەوە بۆ نێو دەریاو بۆ لای کەشتیان. پەناگا، ڕێگای قایم لە دەشت و کێواندا.
**پەساردن**: هەڵپەساردن.
**پەسارگە**: بەندەر، میناى دەریا، ڕێگایەکی بەردچنە لە کەنار دەریاوە بۆ ناو دەریا و بۆ لای کەشتی. جێگایەکە چتی پێ هەڵپەسێردرێت. شاخێکە لووتکەکەی بە لایەکیدا خوواربووبێتەوە.
**پەساکردن** (ئەردە.): خووساندن.
**پەساو** (ئەردە.): پاشاراو.
**پەسای پەس**: بەساپەس.
**پەسە** (ئەردە.): ئەو چتانەن، کە خوواردنیان لێ دروست دەکرێ وەکوو ئاو و ئارد بۆ نان.
**پەسەرپێرارەکە**: بەسرپێرارەکە.
**پەسەرپێرەشەو** (ئەردە.): بەسرپێرەشەو.
**پەسەرپێرەکە**: بەسرپێرێ.
**پەسەک**: پەستەک.
**پەسەن**: پەسند، پە، بژاردە. ـــ کردن: پەسندکردن.
**پەسەناز** (ئەردە.): پاشەکەوت.
**پەسەند**: پەسەن، پەسند.
**پەسەندکەردەی**: پەسندکردن.
**پەسەندکردن**: پەسندکردن.
**پەس بوون** (ئەردە.): دانان، دۆڕاندن.
**پەسپەسەکلێ** (هەورا.): جاڵجاڵووکە.
**پەسپەسەکۆنە** (هەورا.): جاڵجاڵووکە، مێشەگرە.
**پەسپەسەکۆلێ** (هەورا.): جاڵجاڵووکە.
**پەسپەسەکەرە**: داعبایەکی زەردی چنگنە وە جاڵجاڵووکەی دەچێ.
**پەس پەندە** (باد.): مرۆی بێ ناو و کەم نرخ.
**پەسپۆڕ** (زا.): ئافرەتی چەنەباز.
**پەست**: نزم، سووک، هەرزە، بێ شەرم، حیز، کوورنەبەش، (باک.) بێ باش، کەم، پاڵکەتی، دڵنزم، زەبەهە، تووین، پاکوت، زنخ، کەم نرخ، بێ ناو. ـــ بوون: بەپەرۆش وکز بوون. ـــ کردن: نزم و سووک کردن.
**پەستاپەستا**: بەبێ پسانەوە، یەک لەدووای یەکتری، ڕەوەندان ـــ گەرمێن و کوێستانێ دەکەن.
**پەستان**: پەستن، داپەستن، پەستارتن، پەستانەوە.
**پەستانەوە**: پەستینەوە، کوتانەوەی چتی خاو وفش تا توندبێ.
**پەستاندن**: پەستان.
**پەستاندنەوە**: پەستارتنەوە.

پەسپەسەکلێ

**پەستاوتن:** پەستان، داپەستان، داپەستاوتن، داگرتن، پەستینەوە، پەستانەوە. تێ ـــ : تێ ئاخنین، تێ ترنجاندن.

**پەستاوتنەوە:** پەستاندنەوە.

**پەستە:** پەستەک.

**پەستەک:** (ئاک.) پەستە، کەرک، (زێ.) چۆخ، (هەورا.) پەسەک، پۆشاکێکە زۆرتری لە مەرەز یا کورک دروست دەکرێ و بێ قۆڵ و ئەستوورە و وەکوو سیخمەی وایە لەسەر هەموو بەرگێکی لەبەر دەکرێت.

**پەستەکفیشەک:** وەکوو سیخمە لەبەر دەکرێ و هەندێکیش بەتەنیشتی زینێ یەوە دەکەن. فیشەکدانی پەستەکی، جوورە فیشەکدانێکە وەکوو پەستەکی دروستدەکرێ.

**پەستەکۆڵە:** کۆبوونەوەی ژن وپیاوی دێیەکە لەناو تیرەی ئاکۆ بۆ سوونەوەی پەستەک و فەرەجی هەر شەوەی لە ماڵێکی.

**پەستەوان** (باک.): پسوولەی تێپەڕینێیە. دەستوور. پەساپۆرت.

**پەستەوەلات** (باک.): جوورە گۆرانییێکی کوردییە.

**پەست تر:** نزم تر، هەرزە تر.

**پەست ترین:** نزم ترین، هەرزەترین.

**پەستران:** داپەستران. لەخۆوە ئاخنران.

**پەستراو:** داپەستراو، داپەستوو، پەستوو، ئاخنراو، هەلاخنراو، کوتراو، داکوتراو.

**پەستراوە:** پەستراو.

**پەستریێر** (هەورا.): بەسرییێری.

**پەستریێرار** (هەورا.): بەسر پێرار.

**پەستک** (بار.): قەزوانێکی کوشراوی وایە، کە ڕۆنی پێوە نەمێنێ، مرۆیان لە نێو دۆشاوی دەکەن ودەیخۆن و بە وولاخانیش دەدرێ.

**پەستن:** پەستان، پەستین، پەستینەوە، پەستانەوە.

**پەستنەوە:** پەستانەوە.

**پەستوو:** پشت، پشتەوەی ماڵ. هەلاخنراو، پەستراو، ئاخنراو، داپەستوو، داپەستراو.

**پەستی:** نزمی، کەمی، ناکەسی، هیچ وپووچی. تەرک، دڵنزمی. خەفەتباری، خەمباری.

**پەستین:** پەستن.

**پەستینەوە:** داپەستاوتن.

**پەسخەل** (باک.): لاسایی کەرەوە، قەشمەرجار. (باک.) ـــ ی: لاسایی کردنەوە، قەشمەرجاری.

**پەسدان** (ئەردە.): دانەوە، دووادانەوە، گیراندنەوە.

**پەسران** (ئەردە.): داپەسیان، پەست بوون. نووستن، فس خواردنی باڵندەی مێ بۆ نێرینەکەی.

**پەسرۆیین:** دواڕۆیین، دوواکەوتن.

**پەس سەنن** (ئەردە.): ئەستاندنەوە.

**پەس سەندن:** ئەستاندنەوە.

**پەسقەرەوول:** قەرەوولی دووای لەشکر.

**پەسقەلە** (باد.): مرۆی پاسقاڵ.

**پەسکەفتن:** دوواکەتن، پاشکەوتن.

**پەسلان** (باک.): ڕۆژی هەرەدوایی، قیامەت، جێگای هەرەدوایی. لان.

**پەسمەنە:** پەسمەندە، پاشماوە، پاشخوانە.

**پەسمەنەی ئاڵف:** پاشماوەی ئالیک.

**پەسمەنەی ئاو:** پاشماوەی ئاو.

**پەسمەندە:** بڕوانە: پەسمەنە.

**پەسن** (باک.): پاسین، هەڵنان، پێ هەڵکوتن. پەسند.

**پەسناندن:** پەسندکردن.

**پەسند:** پەسەن، پەسەند، کێش، خووەشک، پەسن. بەجێ، بجە، بەرژەوەند، دخووەز، دڵپەرژیر. ـــ بوون: کێس بوون. ـــ کردن: ڕا لێ بوون، پێچاکبوون، هەڵبژاردن.

**پەسندان** (باک.): پێ هەڵکوتن.

**پەسندی:** چاکی، ڕا لێ بوویی.

**پەس نشین:** دوواکەوتوو، خووارەو هاتوو، بەرەودووا. ـــ ی: دواکەوتوویی.

**پەسنۆیی** (باک.): بەخۆفش، کەسێکە بەخۆی هەڵبلێ.

**پەس نیشتن:** دوواکەوتن، خووارەوەهاتن. پاشە کشێ، هەلاتن.

**پەسوا پەسی** (ئەردە.): پشتاوپشت، پشتەودووا.

**پەسوان** (کۆ.): خێوتن، خێوان. ڕێکەوتن، ڕێککەوتن.

**پەس وپلن** (ئەردە.): چاڵ وچۆڵ، چاڵچاڵ.

**پەسی** (ئەردە.): دانان، دانیان، دۆڕاندن لە قومار دا. چاڵی، چالاّیی، داکەفتەگی، داکەوتوویی. (ئەردە.) ناکەسی، لێ کەوتوویی، لێکەفتگی.

**پەسیرە:** قۆرە، (کۆ.) پەسیلە، بەرسیلە، ترێی نەگەییوو. هالە.

**پەسێرە:** شەومەندە بریتییە لە چێشت کە لەشەودا بکرێت و بمێنێتەوە بۆ ڕۆژ.

**پەسیرەمارانە** (دەر.): ترێ مارانە.

**پەسیسە** (شا.، هەورا.): تەروو. چتی نێچگار زۆر سارد لەبەر ساردی وەی دەچووێنن، دەڵێن: دەڵێی پەسیسەیە هێندە ساردە، یا وەکوو دەمی مردووی ساردبۆتەوە. (ڕۆژ.) چتێکی شلی هێندە کولاوە، کە ئاوەکەی هەڵێنجرابێ، جا شلە برنج بێ یا شلە ساوار.

**پەسیف** (باد.): هەلامەت.

**پەسیلە** (هەو.، کۆ.): قۆرە.

**پەسیو** (موک.): پەنا، قەف، هەنووان، بابەیڕ، بابوهێڕ، (باک.) بابووێڕ. جێگایەکە با نەیگرێتەوە، قوژبن. پەنا، داڵدە، (خۆ.) پەناڵ. (هەو.) هەلامەتدار، باهۆڕ، ئارسم، پەتا، درم، پەسیف. ـــ ی: هەلامەت.

**پەش:** بەشە، بەهرە. (باک.) ڕەشانگ، دەنگێکە گاجووتی پێ دەردەکرێ.

**پەشام** (ئەردە.): ئاماس، پەنام، هەواکێشان.

**پەشانۆ:** پەرێشانکار، پەرێشانکەر، بەپێی بەیتی بارام و گوڵندام.

**پەشە:** مێشوولە، پەخشە، توفانە.

**پەشەبەن:** پەشەبەند.

**پەشەبەند:** کوللەی مێشوولە، پەردەی تەختی خەو.

**پەشەن:** پەشەنگ، ناوی باوکی (ئەفراسیابی) یە.

**پەشتان** (ئەردە.): دەستەملان، ملەما، دەست لە گەردن.

**پەشت ئێشای** (هەورا.): پشت ئێشان.

**پەشتەپەشت:** کاری پڕوپووچ، ووتەی پڕوپووچ، خۆتێهەڵسوون، خۆ لەکارێک هەڵقورتاندن، خۆتێهەڵقورتاندن.

**پەشتەماڵ:** پشتەماڵی گەرماوێ لە بەخۆوە دەگرێ. فۆتە. دەستەبر.

**پەشت مل** (هەورا.): پشت مل، پژمل.

**پەشتن** (باڵە.): ڕستن، ڕێستنی خوری و لۆکە و ئیتر.

**پەشت وملی** (هەورا.): پژمل.

**پەشک** (باک): پڕیشکی ئاووری. دڵۆپەی ئاو و چتی تر.

**پەشلاندن** (باک.): پەرش و بڵاوکردن. بپەشلینە: پەرش و بڵاوکەوە.

**پەشلین** (باک.): پەرش و بڵاوبوون. بپەشلە: پەرش و بڵاوبە.

**پەشم** (زەن.، ڕۆژ.): خوری. ئاخۆتنی بێ نرخ: ئەم قسەیە لەلام پەشمە.

**پەشمە** (زێ.، بار.): ڕانک.

**پەشمەک:** جوورە شیرنیاتێکی داوداو و ڕیشاڵ ڕیشاڵە وەکوو خوری شێ کراوەوە وایە.

**پەشمەنە** (فە.): پاشماوە.

**پەشمین:** چتێکە لە خوری دروستکرابێ.

**پەشمینە:** پەشمین، بەنین بەپێچەوانەی دەزگین واتا پەلاس، بەڕە، کە لە خوری دروستکرابێ.

**پەشووش** (ڕۆژ.): خاکێکە سستەک و خاو و ڕزیو و فشەڵ بێ و هەڵوەرێ، واتا پتەو نەبێ. چتی شێواو ونەرم.

**پەشۆک:** پەشێو، شپرزە، شێواو.

**پەشۆکان:** شپرزەبوون، تێکچوون، ناژاوەبوون، شێوان، پەشێوان، حەپەسان، سەر لێشێوان، سەرسووڕان، شەپۆپان. ـــ دن: شپرزەکردن، پەشێواندن، شێواندن، تێکدان، سەر لێشێواندن، شەپۆکاندن، حەپەساندن.

**پەشۆکاو:** شپرێو، ڕەت بڵاو، پەنزهار، شپرزە، پەشێواو، شێواو، تێکدراو، سەرسووڕماو. گیانداری شپرزەی سەر لێشێواو.

**پەشۆکی:** شپرێوی، شپرزەیی، پەشێواوی، شێواوی، تێکدراوی، پشێوی، ئاژاوەیی.

**پەشۆکیان** (ئەردە.): پەشۆکان، جووڕیان.

**پەشیلاندن** (باد.): ڕووخاندن.

**پەشیلین** (باد.): ڕووخان.

**پەشیمان:** پژمان، پۆشمان، (باک.) ژووڤان. پێ لەپاش، بادەرەوە، گەڕاوەوە، (شا.) ژیوان، (جا.، بابا.) پاشگەز، (ئەردە.) بازگەشتەبووک. ـــ بوونەوە: پشتی دەستگەزتن، سەر لەبەردان، سەرخووە ڤەهاتن، ساردبوونەوە، بادانەوە، گەڕانەوە، وادانەوە. ـــ کردنەوە: ژیوان کردنەوە، پۆشمان کردنەوە. ـــ ی: شاگەزی، ژووڤانی، پۆشمانی، پێ لەپاشی، بازگەشی، گەڕیانەوە، هەڵگەڕیانەوە.

**پەشێو:** پەرێش، پەرێشان، پەکەر. ئاڵۆز، شێواو، شپرزە، سەرسووڕماو. واق وورماو، شلووق، سەر لێشێواو، پەژێو. ـــ بوون: شێوان، شپرزەبوون. ـــ کردن: شێواندن، شپرزەکردن.

**پەشێوان:** شێوان، پەشۆکان.

**پەشێواندن:** شێواندن، ئاڵۆزکردن، پەشۆکاندن، شپرزەکردن، پشێواندن.

**پەشێوو:** شێواو، ئاڵۆز، پەشێو، شپرزە، سەرسووڕماو، شلووق، واق وورماو، پەشۆکاو.

**پەشێوی:** پەشۆکاوی، شێواوی، شپرزەیی، پشێوی، سەرلێشێواوی.

**پەشێویان** (ئەردە.): پەشێوان.

**پەڤ** (باک.): پێکەوە، بەهەڤ. ـــ چوون (باک.): پێکەوەچوون. لێکدان، شەڕ پێکەوەکردن. (باک.) ـ کەتن: وێککەوتن. (باک.) ـــ اندن: تەقەکردن، تەقاندن. بپەقینە: بتەقێنە.

**پەقاو:** تەقاو، تەقیو.

**پەقپەقۆک** (باک.): دوومەڵ، قوونێر.

**پەقرە** (باک.): پێکەوە، تێکڕا، گشت. دگەل هەڤ.

**پەقرەج** (هەو.، بڵ.): سەتڵ. جوورە سەتڵێکە.

پەقرەج

**پەقزک** (باد.): بڵقی زۆر و ووردی سەر ئاوێیە.

**پەقۆ** (خۆ.): چێشتی گەغەکوتاوێ.

**پەقیاو:** تەقیو، تەقاو.

**پەقیژۆک** (باک.): بڵق. دوومەڵ، قوونێر. (باک.) پەقپەقۆک.

**پەقین** (باک.): تۆقینی چتێکی، تەقین. بپەقە: بتەقە.

**پەک:** بەند، تخ، ڕاگیر، تەگەرە، مەحتەلی، دەستەوەستانی. ـ خران: ڕاگیران، بەندکران. ـ خراو: ڕاگیراو، بەندکراو. ـــ خستن: تخ تێدان، ڕاگرتن، ژیەرڤەکرن، نەهێشتن، بەندکردن، لە باڵدان، هەڵبەستن، بەرهەڵستکردن، نەهێشتن، پێشگرتن، بەربەپنەوە، دوواخستن. ـــ تێخستن: لە کارخستن. ئامرازی سەرسووڕمانە، پەککوو. ـ تێخەر: خەباتکوژ.

**پەکان:** وێران، کاوول، کەمباخ. پێک و ـ دان: وێرانکردن. (باک.) ـــ دن: ڕاپێکردن، ڕاونان. بپەکینە: بڕەوە، ڕاوی نێ.

**پەکەر** (ئەردە.): پەشێو.

**پەکخەر:** دڵۆتێخەر، نەهێژ.

**پەکخستن:** لەکارخستن.

**پەکک:** پەککوو.

**پەککەفتن:** پەک کەوتن، داماں.

**پەککەوتە:** پەک کەوتوو، داماو.

**پەککەوتن:** پەک کەفتن.

**پەککەوتوو:** دەستە ووستان. داماو، دامنە، پەک کەوتن.

**پەککوو:** پەکوو، بۆ واق ووڕمانێیە: ـــ نەتەوەی کورد چەند ئازا و نەبەزە!!!

**پەکوو:** (باک.) پەککوو، حەیف، داخ، ئاخ. پێک. وای، داخەکەم، پەکوپۆک، پەرۆش، داخەکەم، بەداخەوە.

**پەکووپۆک:** پەکوو، حەیف.

**پەکین** (باک.): هەلاتن، ڕەوین. بپەکە: هەلبێ، بڕەوێ.

**پەکڕ:** کەوە، گەمرە، پەین وشیاکەی داپەستراو وڕەق.

**پەل:** دۆڵ و نێوانی دوو شاخان. پەرێک قاقەز، کە دوولاپەڕەیە. دۆڵ، شیو، دەرە. (موک.، هەورا.، ڕۆژ.) ئەندام، دەست، قۆڵ و باسک. چووار ـــ : چووار ئەندام. ـــ کوتان: تەقەلادان، پەلەپرووزە، پەلەفرکێ، جوولانێکە لە کاتی تەنگانەدا. جوولانی هەرە دووایییە لەکاتی گیاندانێدا. قەلبە، دەرخک، هەلووک، دارێکی کورتە هەردووک سەرەکانی پەلن. (پیرە.) مرازێکە لە کەرەستەی جووتیدا. قەلت. ـــ کردن: بڕینەوە، هەلپرداوتنی سەری هەلووک و پێنووس و ئیتر، قەدکردن، تەرەفاندن، لەتکردن، پارچەکردن. بۆ قاپێک و دەفرێکی دەبێ سەر پەل بێ واتا بلاو، فراوان، گوشاد، قوول نەبێ، سەری بەلای دەرەوەدا نوشتابێتەوە بۆچک. داو، تەلە، رووشە. بە ـــ وەکردن: تووشی داو و تەلەیێکی کردن. (کە.، بابا. ڕۆژ.) نەوی، لێژ، نەرم، نشێوی، دۆڵ، دەرەخرکە. ـــ بەرد: خرکە بەرد، دەستە بەرد. گلمەت، سندەگل. توندوتۆل، گورج وگۆل. پۆلوو، پەنگری ئاگری، پشکۆ. (باک.) بەخت، هات، نارچەوان. گەلاّ. چەقەسوو، سووالو، بێ ئابڕوو، چەختی، چوختی، بێشەرم. لکە دارێکی بڕاوە کە بچەقێنرێ. پەڕی بالندان. پارچە، لەت، کوت. لق و پۆپی دارو درەختانە.

**پەلّ** (ڕۆژ.): پەلەبەرد، دەستەبەرد یا کولو گلمەتێکی گەورەیە، کە بهاوێژرێ.

**پەلاپیتکە:** پەلەپیتکە.

**پەلاپیسکە:** کرمێکە لەناو تووێی گەلاّی دەغلاّن دەدا زیان بە دانەکەی دەگەیەنێ، پەلەپیسکە.

**پەلاّتە** (ڕۆژ.): سکالاّ. داوای پێکهێنانی کارێکی لە فەرمانگە یا لە کەسێکی کردن.

**پەلاّتەمان** (باک.): کۆڕ، ئەنجومەن، کۆگە.

**پەلاختن:** جیق دەرهێنان، فلیقاندنەوە، پلّخاندنەوە. جنێودان.

**پەلار** (ڕەوا.): پللار، تەشەر، تانووت.

**پەلازگ** (باد.): گولێکە ڕەنگی سپی و سوور دەنوێنێ.

**پەلاس:** کوریێن، شڕەی ئەستوور و کۆن و دڕاوی هەژارانە، سیپاڵ، سیپالّە کۆن، پەلاسی شڕ. کوورێنی چادران. ڕایەخ، ڕاییخ. (ڕۆژ.) جەرگ سووتان. گەمروو ووشکی لەتێنوان. بار، پیلوس. خۆلێکردنە ـــ : خۆلێکردنەپیلۆس.

**پەلاش:** پووش وپەلاش. پووشێکە لە پنجەکەی بووبێتەوە و کەوتبێ.

**پەلامار:** حەمبارۆزی، دووکووم، هێرش، هەلمەت، (باک.) ئێرس. چەمارۆ، گەمارۆ. شاتاڵ. شلّنگ. دارسکان. ـــ دان: حەمبارۆزیدان، گەمارۆدان، داڕسان، هەلکوتانەسەر، هێرش بردنەسەر، هەلمەتبردن، شاتالدان، شلنگدان. ـــ بردنەسەر: پەلاماردان.

**پەلاماردان:** هێرش بردنەسەر، گەمارۆدان، داڕسان، هەلکوتانەسەر، هێرش بردنەسەر.

**پەلامێز:** مێز بۆ دوورەوە فڕێدان، پەلەمیزە.

**پەلاّن** (ئەردە.): ئێسک، ئێسقان.

**پەلان:** دەستلێدران، ئەوازشکران.

**پەلاندن:** دەستلێدان، ئەوازشکردن. بپەلینە: دەستی لێبدە.

**پەلاو:** پلاو.

**پەلە:** نیتک. بێ ـــ : ئاقیرە. (باک.) لۆکۆک، لەکە. نیشانە، پلّ، خالّ، چیک، پنک، نتک. ـــ هەور: پارچە هەور. بارانەیێکە لە کاتی پێویستی پاییز و بەهاراندا بۆ کشتوکالّ و شیناوەردیان بباریّ و تێراویان بکات. هەوەلّ. سەرپەل. هەربەهۆی ـــ وە عارد و زەوی ڕەق نەرم دەبێ و ئەوسا جووتی لێدەگیرێ. پارچەیەک لە دەغلّ و ئیتر و پارچەیێک لە زەوی. پارچەیێک لە توتن و بێستان. (ئەردە.) تالووکە، پەلە.

**پەلە:** پەلّە، هەلّە. تالووکە، لەز، تاو، ساتی، هەلّەداو، گوژم، تەووژم، تیژ، دەست وبرد، خێرایی، دەسواکرد. بە ـــ : خێرا، بەهەشتاوی، بەتالووکە، چک، بەگووڕ، چابووک، هەلّەدان، بەلەز، پێتمار، (باک.) وەتاو. لنگە تەرازوو. (ئەردە.) داوێنی کالاّ. داوێنی شاخ وگرد. پەرەی قاقەزی. تای چت وەکوو تای بارو تەرازوو. (باک.) شل؛ گرارا تە پەلەیە: واتە چێشتی تۆ شلە. (باک.) پۆلوو، پەنگر. بەرد، پەلە بەردێک.

**پەلە ئەساو** (هەورا.): پەرەی ئاشی.

**پەلەبزووت:** (هەورا.، دەر.) پەلەبزۆت. سەلکە بزۆت.

**پەلەپەل:** پەلّەوداوان، گورەگوڕ. هەلّەهەلّ، تالووکە، پەلەقاژە، پەلەو تالووکەی بێ پسانەوە، هەلّەو پەلّە. وەپەلەپەل کەوتن: تاودان. ـــ خستن: تاودان.

**پەلە پەلە:** پەڕە پەڕە، تۆتۆ، تووێ تووێ. پەردەپەردە.

**پەلّەپەلّە:** پارچەپارچە. پلّپلّ، خالّخالّ، پنک پنک، بەلّەک، پنپنی.

**پەلەپچوورکێ:** تالووکەیەکە بۆ ئەوەی خۆ لە چوورتم و کارەساتێک ڕزگارکردن.

**پەلە پرووزە** (جا.): پەلّەفرکێ، پەلکوتان، پەلەکوتێ. تەقەلا، هەولّ. جوولانێکە لە کاتی تەنگانەدا، دووامین جوولانە لە کاتی گیاندانێدا.

**پەلەپرووزکێ:** پەلەپچوورکێ.

**پەلەپرووزێ:** پەلەپرووزە.

**پەلەپروسکە:** پەلەپرووزە.

**پەلەپرووسکێ:** پەلەپچوورکێ، خۆکوتان بۆ گەیشتنە چتێک و یان لە تێنوان خۆگەیاندنە کانییەک.

**پەلەپسکێ** (ئەردە.): بالّە شۆڕێ، بالّ فشەوکردن.

**پەلەپفە:** نانی تیرییە، کە بە ئاوور گەرم بکرێتەوە بۆ ئەوەی سووربێتەوە و ناسکبێ.

**پەلەپیتک:** پەلەپیتکە.

**پەلەپیتکە:** (هەورا.) پەلاپیتکە. پتیک. بە هەردووک قامکی دۆشاو مژە بەردێکی بچووک ڕێک کووشین و ئاوێژتن. پلّتۆک. ـــ ی دەمانچە و تفەنگە، کە قامکی دەخرێتە سەری و ئاووردەدرێ.

**پەلەپیسە:** پەلەپیسکە.

**پەلەپیسکە:** (هەو.) پەلاپیسکە، پەلەپیسە. کرمێکی ڕەشە لەنێو تووێی گەلاّی دەغلّی دەدات بێ زیانە.

**پەلەتک**: پەتک، گوریسێکە لە پەتەی دروستکرابێ.

**پەلەخ**: تووتنی وورد. (باد.) شوێنی پووش وپاوانانە. گیایەکە. (پیر.) پالاخ.

**پەڵەدار**: نیشانەدار، خاڵدار، پنکدار.

**پەلەدار**: پارچە دارێکی کورتە.

**پەڵەدان**: ئەو ئەندازە بارینەیە، کە زەوی خووسـاندبێ و بە ئاسانی جووتی تێدابکرێت و کرە لەگاسنیەوە نەیەت.

**پەلەزێ**: گوڵە پەمۆ، گوڵە لەبان. گوڵێکی کەوی و کێوییە بە سپی و شین دەنووێنێ، کە ئەو گوڵـە پێگەیشت: بزن دەزێ، سـەرهەڵدانی پەلـەزێ: نیشانەی بزنە زێیە.

**پەلەسەنگ** (فە.): زۆر و زەوەند.

**پەلەسیسە**: جوورە نەخۆشییێکە کـە لـەمێوی بـدات چەند گەڵایـەکی سیس دەکات بەلق و تەرزەکانیەوە.

**پەلەشوانە** (سەق.): نێرتکەشووانە، جوورە گیایەکە.

**پەلەفرتە**: پەلەفرتکێ.

**پەلەفرتکێ**: بروانە: پەلـەفرکێ، پەلەقاژە.

**پەلەفرتێ**: پەلەفرکێ.

**پەلەفرکێ**: پەلکوتان، پەڵەشەرێ، پەڵپلان.

**پەڵەفرکێ**: پەلەفرکێ.

**پەلەقاژە**: پەلەپەل، هەوڵ، تەقەلا. ــ دان: بەهەموو توواناییەکەوە هەوڵ و تەقەلادان و چنگ قژکردنەوە لە کاتی تەنگانەدا.

**پەلـەقاژێ**: پەلــە قــاژە، پەلـەکوتێ، هـەڵژلیویان، هـەڵفلیقیان، دەسـوپا وەشانن. پلووشانن.

**پەلەکردن**: تاڵووکەکردن.

**پەلـەکوتێ**: پەلـەفرکێ، دوواهـین جووڵانـە لـە کـاتی تەنگانـە و یـا گیاندانیدا. دەستکوتانی کوێرە یا چاو ساغە لە تاریکیدا.

**پەلەمیزە**: پەلامیزە، میز بۆ دوورەوە فرێدان.

**پەلەندار**: دارەدەست بۆ هاویشتن، پلار.

**پەلەنگ** (لو.): پڵنک.

**پەلەواز** (هەو.): سەرەوژێر.

**پەلەوەر** (بابا.، هەورا.): باڵندە، باڵدار، پەرەوور، مـەل، پەلـەوور، مر، پەڕندە.

**پەلەوەرگ**: پەلـەهوور، ئەو پارچە وورگەیە، کە دەکرێتە گیپە.

**پەلەوور**: باڵندە.

**پەلەوورگ**: پارچە وورگی ئاژەڵ.

**پەڵە هەوور**: گەراڵە، پارچە هەوور، لەکە، تەوقن، تیکە.

**پەڵە هوور**: پەلـەوورگ. ئەو پارچە وورگەیە، کە دەکرێتە گیپە.

**پەڵەی بچووک**: یەکەمین جارە کە کەمێک بارانە بباریێ.

**پەڵەی گەورە**: بـارانی دووەمـە، کـە باشیش ببـارێ و زەوی و کشـتوکاڵ تەواو تێراو و پاراو بکات.

**پەڵپ**: بیانوو، بیانگە، بەهانە، پرزە، ڕک، وورک. ــ بڕیـن: پرزەبڕیـن. ــ گرتن: بیانووگرتن، بەهانەهێنانەوە.

**پەلپـەل**: پلپـل، پارچەپارچـە. ــ بـوون: پارچەپارچەبوون. ــ کـردن: پارچەپارچـەکردن، (بـاک.) تیکەتیکـەکردن. ئاخۆتنێکـە کـە تێکـەڵ و پێکەڵ بێ مرۆ تێینەگا. قوڵتەقوڵتی دەنگی کوڵاندنێیە.

**پەڵپەلاێ** (ئەردە.): پەلهاوێژتن بۆ یەکتری، پەلەشڕی، پەلەفرکێ.

**پەلپسکیان** (ئەردە.): باڵشۆڕبوونەوە.

**پەڵپگر**: بەهانەگر. ــ تن: بەهانەگرتن، بیانووگرتن.

**پەڵپین**: نوشتەی چاو وزاری.

**پەڵپینە**: گیایەکی ئاوییە و ئاسکە لەناو سەوزاییدا پەیدا دەبێ، گەڵایەکی وورد و ئەستوور و ترشی هەیە دەکرێ بە چێشت. (بابا.، هەو.) پرپرۆکە، پرپرە، (باد.) پیڵپینە.

**پەڵت** (ڕۆژ.، دەر.، هەورا.): لـە سـەرمان یـا لـە تینـوان و یـا لـەبەر نەخۆشی زمـان شکان واتا زمـان پەڵتبوون و تووانـای ئـاخۆتن نـەبوون. لاڵەپتە، لاڵەپەتە.

**پەڵتە**: پڵتە.

**پەڵتەک** (فە.): بەردتاش، پاڵتەک.

**پەلچەرمە** (هەورا.): پەلسپی، وولاخی بەرزە.

**پەلچقاندن** (بـاک.): هـاڕین، شـێلان. جیـق دەرهێنـان، فلیقاندنـەوە. جنێودان. بپەلچقینە.

**پەلچقین**: جیق دەرهاتن، فلیقانەوە. بپەلچقە.

**پەلچم** (باک.): گزرەی گەڵا دارانە بۆ ئاژەڵان.

**پەلچمۆک** (باک.): چەکچەکیلە.

**پەڵخ** (کە.، جا.): پالاغ. کوودەڵەی بەرازییـە. (ڕۆژ.) جوورە سـەگێکی زەلام وگەورەیە.

**پەڵخاندن**: پڵخاندنەوە. بپەڵخینە.

**پەلخاندن** (باک.): پڵخاندنەوە، ووردوخاشکردن، پەڵخاندنەوە.

**پەڵخە گامێش**: پالاغ. تەمبەڵ، تەڵەو زگپەرست.

**پەڵخور**: خوواردنێکە باش نەجووڕابێ.

**پەڵخورد**: خەرمانێکـە لـە ژێر گـێرەدا قرچەشکێن کرابـێ. چـتی نیـوە ووردکراو. ــ بوون: نیوە ووردبوونی چت. ــ کردن: نیوە ووردکرنی چت.

**پەلدان**: پەلهاویشتن، بلاوبوونەوە.

**پەلدانک** (باک.): پەراوی ودەفتەرێکە قاقەزی تێبنرێ.

**پەلساندن** (باک.): ووردوخاشکردن، هاڕین، بپەلسینە.

**پەلسین** (باک.): ووردوخاشبوون. مەلسین.

**پەلشاندن** (باک.): وێران و کاولکردن، فەلشاندن. ژەهڤ چراندن.

**پەلک**: (بـاک.) بلـۆق. (هـەو.) گـەڵای دار و گـوڵ و نیدیکەیـە. لقـی داڕودرەخت. گووفـەک، سـەرگووێلک، سـەرانگووێلک، جێگـای خۆڵـە مێشییە. پەری گوڵی. پێڵوو. ــ ی چاو: پێڵووی چاو. (باک.) هەلووک.

**پەڵک**: پیلووی چاو. زرە ئەسپیندار، جوورە چنارێکی جەوهـەرداری وە چناری دەچـی بـەلان وەکـوو وی ڕاسـت و چـاک نـابێ و پـەلکی خڕتـرە، بەرەکەشی وە قۆزەی دەچێ و ناخورێ. سوورە چنار.

**پەلکە** (کەل. ، هەورا. ): پرچی هۆنراوەوە. پەلیک. گوجی، بەندی کەوا و کراس و ئیتر.

**پەلکەبەدراوە:** پەلکەدراوە.

**پەلکەدراوە:** پەلکەبەدراوە، گیایەکە دوو بست بڵند دەبێ و گەڵای وەکوو پارەیە گوڵی زەردە دووای گوڵەکان، کە وەرین لە جێگای وان چتێکی باریک وخڕ دەردەکات وەکوو تەنگوستیلەی وایە.

**پەلکەڕەنگینە:** کۆلکە زێڕینە، (سوور. ) پەلکە زێڕینە.

**پەلکەزێڕینە:** کۆلکەزێڕینە، کەوانەییکی ڕەنگاو ڕەنگە لەسەر ڕووی هەور پەیدادەبێ لە کاتێکیدا، کە خۆر لە دڵۆپەی بارانەکەی ناو هەورەکە دەدات حەوت ڕەنگی لێ پەیدا دەبێ: وەنەوشەیی، شین، لاژوەردی، سەوز، زەرد، پرتەقاڵی، سوور.

**پەلکە مێو:** گەڵامێو.

**پەلکدار:** ئاسنێکی دوو پەلی لووت تیژە نەخش وگێڕی پێدەکرێ.

**پەلکردن:** کەلکردن، قەلکردن. پارچەکردن، بڕین، پەیکردن. دادان وەکو سەری هەلووکی.

**پەڵکو** (خۆ. ): پاککراو.

**پەلکوتان:** دەستکوتانی کوێر و چاو ساغ لە تاریکیدا. بڕێتییە لە ڕەنج وتێکۆشان.

**پەلکوتنن:** پەلکوتاندن.

**پەلکوتاندن:** هەوڵدان، دەستکوتان، تەلاش، تەقەلادان.

**پەلکین** (باک. ): خۆکورووژم هەڵێنان، خۆوێک هێنان، بە چووار پەلان ڕۆیشتن.

**پەلگر** (باک. ): ماشە، مەقاش.

**پەلگرک** (باک. ): ماشە، مەقاش.

**پەلگرۆ:** پەلگەزک، (باد. ) ماشە.

**پەللووس** (خۆ. ، هەو. ): لا لووسکراوەکەی جگییە. منداڵی بێ شەرم و سوورتک. (هەورا. ) پلۆس.

**پەلم** (باک. ): پووشل، بێزوبۆ. نەفرەت، موونج.

**پەڵمو:** ئاوساو، پەغاو، پەفیاو.

**پەڵوو:** (دزە. ، کۆ. ) لۆلکە. (باک. ) ئارخاڤک. (هەورا. ، کە. ) پەڵوولە. ئاردەوا، ئاردەپێچ، خواردەمەنییێکە لە ئارد و ڕۆن و ئاو دروستدەکرێ. بۆ کار و بەرخان بەبێ چەوری دروستدەکرێ.

**پەڵۆ** (باک. ): جوورە گەمەیەکە.

**پەڵۆەشانن:** پەڵوەشاندن.

**پەڵۆەشاندن:** پەڵوەشانن، پەلکوتان، پەلەکوتێ، پەلەقاژێ. گەزارەکێشان، جنێودان.

**پەڵوویۆ:** هێز وتووانا، هەرەت. پەڕ و تووکی باڵندان، پەڕوباڵی باڵندان، پەڕوپۆ. سامان. لق و پۆپی داروەرەخت. مەبەس لە وەچە و نەتەوەی زۆرە.

**پەڵۆخ:** پۆخڵ.

**پەڵۆختە** (باک. ): شاپڵیتە.

**پەڵۆسان:** (هەورا. ) پلۆسان.

**پەڵۆش:** بنکەگیایەکی ئەستوورو درێژ و قژقژاوییە لق و پۆپی بۆ ئاژاڵان دەردەهێنرێ و بە دەست شێدەکرێتەوە بۆ چاوگی ئاگر. گەوون. (هەورا. ) پەرۆش. گیایەکە گەڵای وەکوو گوێی تاجی وایە و قەراخی گەڵاکانی وەکوو دەمی مشاری و دڕاوییە، چەند گوڵێکی زەردی دڕاوی دەردەکات. کۆڵووی سووتاندنێ هی بن پەڵۆشەیە، کۆڵوو.

**پەڵووک:** هەڵەکۆک، ئاڵەکۆک.

**پەلووکە:** تەختە ساف، تەختە تیرە.

**پەلوو گۆش** (هەورا. ): بەڵگەی گووێ.

**پەلوول** (باک. ): کولاو.

**پەڵوولە:** پەڵوو. جوورە هەڵوایەکیشە لە ئارد و ڕۆن و شیرینی دروستدەکرێ. ــــ باسووق: پەڵوولەی باسووق بە بادامەوە. جوورە شیرنیاتێکە ومسجووقی دەچێ.

**پەلهاویژتن:** پەڵوویۆکردن، پیدرێژی کردن.

**پەلهەویش** (باک. ): گیایەکە.

**پەلهوورک** (باک. ): پەرانتوو. وورده پەلک.

**پەلیار:** (ڕۆژ. ) بەتۆرە، خووێرێزک، بەشێواز. (فە. ) ئەستونده، کۆڵەکە.

**پەڵیت** (ئەردە. ): هەڵیت، شڕو وور، کەلپەترە.

**پەلیس** (هەورا. ): تیسماڵکێکی پان و تەنک و تیژە.

**پەلیسە** (باک. ): تالان.

**پەلی سیاوەشان:** (هەورا. ) چەمە سیاوڵە. قەیتەران. گیایەکە گەڵای وەکوو گەڵای کەرەووزە و لاسکی باریک و درێژە و زۆر ڕەشە لەبن کاچ وقەلبەزدا سەوز دەبێ بۆ زۆر جوورە دەرمانان بەکاردەبرێت.

**پەلیشاندن** (باک. ): پەرێشانکردن. بپەلشینە.

**پەلیشین** (باک. ): پەرێشانبوون. بپەلشە.

**پەلیڤان** (باد. ): پاڵەوان.

**پەلیک** (هەو. ، کۆ. ): (باد. ) هەلووک. خواردەمەنییەکە بووبێ بە پەسیسە.

**پەلیکانێ** (هەو. ): هەلووکێن.

**پەم** (ئەردە. ): لۆکە، پەمە.

**پەمە** (ڕۆژ. ، هەورا. ): لۆکە، پەنبە، پەمۆ.

**پەمەتۆمە:** پەمۆدانە.

**پەمەدان:** پەمووانە، پەمەتۆمە.

**پەمەیی:** پەنبەیی، ئاڵی سووک. لۆکەیی، پەمۆیی.

**پەمبە:** پەمە، لۆکە.

**پەمبەیی:** ڕەنگی ئاڵ، چونکو وگوڵی پەمۆ ئاڵە، (باک. ) بێزی، (ڕۆژ. ، هەورا. ) پەمەیی، پەنبەیی. جوورە گوڵێکی ئاڵیشە.

**پەمبوو** (باک. ): لۆکە.

**پەمبێ** (باد. ): پەمۆ، لۆکە.

**پەمتێ** (باک. ): چێشتی گەغی شینە.

**پەمگ:** لۆکە، پەمۆ.

**پەمڵەپڕێ** (ئەردە. ): تفەنگێکە بە باڕووت و پەڕۆ دا گیرابێ بەبێ گوللە.

**پەموو:** (دەر.، باک.) لۆکە، پەمۆ، (دزە.) لۆکەیە لەنێو قۆزاخەکەیدا. گیایەکە لە سەرەتای بەهاریدا بەتۆو دەچێنرێت، نیو بەژن بڵند دەبێ گەڵایەکانی کەمێک پانن و گوڵێکی شین دەردەکات لەدووراییدا گوڵەکە دەبێتە قۆزاخە تا سەرەتای پاییز دەم دەکاتەوە ناوەکەی پڕە لە لۆکە ئەوجا (لاکۆ) کەر لۆکەچن دەیچنێتەوە و دەیباتە ماڵێ.

**پەمووانە:** پەمۆدانە، تۆوی لۆکە.

**پەموودانە:** دەنک و تۆوی پەمۆیە.

**پەموورە:** پاموورە. چتێکە ژنان بۆ جوانی دەیکەنە پێیان لە زێڕ یا لە زیو یا لە زەنگیانە و مووروو.

**پەمیان:** ئاوروسان، هەڵامسان.

**پەمین** (ئەردە.): ئاوروسان پەغین.

**پەن:** پەند. کەتن، کەڵەک.

**پەنا:** دەرەتان، ڕزگارگە، پەناوپەسیو، کەلێن، کولێن، بابوێر، (باک.) ئێوورکە، ئەولەگا، بابوهێر، (باک.) بابهێر، قوژبن، داڵدە، ئەوا، نوواسایە، پەنابا بۆ لێقەوماوان، (دەر.، دزە.) نووان. شەقۆق، شەقووق، قەف، هەمەت، هەنووان. ــ بردنەبەر: سەروێنان. ــ دان: قەفاندن، داڵدەی کەسێکیدان. بێ ــ : بێداڵدە، بێ ئەوا، شەقدەر. بێ ــ یی: بێ داڵدەیی، بێ ئەوایی.

**پەنابا:** پەنا، پەناگا.

**پەنابات:** دەشاییە، کە دەکاتە نیو قڕانی کوێستانی و نزیکەی دوو فلسە.

**پەناباد:** پەنابات.

**پەنابەر:** هانابەر، پەناهندە.

**پەنابردن:** هانابردنی لێقەوماوان بۆلای یەکێکی بۆ کارێک یا بۆ پاریزگارییەک، خۆ خستنە ژێر سایەی... .

**پەناپەسیو:** شوێنی خۆ تێدا مەلۆسکردنە، کە لەبەر چاوان نەبێ.

**پەنار** (باک.): کانی، سەرچاوە.

**پەناگا:** پەناگە، داڵدە، سایە.

**پەناگە:** پەناوپەسیو، پەناگا. ئەولەگا، (باک.) نیوورگە. پەڕگە، جێگای کلا.

**پەناگرتن:** خۆ خستنە داڵدەی کەسێک یا شوێنێکی ئەدیوەوە. خشتبوونی مانگ و هەڵاتنی بەجۆرێک، کە بکەوێتە دووای ئاوابوونی ڕۆژ. نیشتن، ئاوابوونی مانگ یا ڕۆژ. لەبەر بار و گێچەڵان خۆ خستنە پەناوە.

**پەناڵ** (خۆ.): پەسیو، پەنا، داڵدە.

**پەنام:** وەرەم، ئاوساو، خۆ خستنە پەناوپەسیوانەوە. (ئەردە.) داپۆشراو. شاردراوە، شارباگ. ئاوسان، پەغان. پاشمد پێوار، پەی سەر، پشتەسەر.

**پەنامەکی** (ئەردە.): پەنهانی، پۆشراوی، پۆشیدەگی.

**پەنامکردن** (ئەردە.): داپۆشین، شاردنەوە.

**پەنامگا** (ئەردە.): پەناگا، مەکۆ.

**پەناوپەسیو:** کون، قوژبن، پەنا، پەناگە.

**پەناهندە:** پەنابەر، هانابەر، دەسەداینە.

**پەناهێنان:** هانا هێنانی لێقەوماوێک بۆلای کەسێکی تا بپارێزرێ.

**پەنای بێدەنگ:** گەمەیێکە، دەستەیێک بەخڕی دادەنیشن وەستاکەیان لە یەکێکیان دەدا ئەویش لەوی تەنیشتی خۆی دەدا هەربەو جۆرە تا دەگاتە لای وەستایەکە.

**پەنەرشکە** (ئەردە.): نووسەنەک، پەنیرشک، پەرەنشک.

**پەنەرێشکە** (ئەردە.): نووسەنەکی.

**پەنەزانای** (هەورا.): پێزانین.

**پەنەمیان** (فە.): ئاوسان، هەڵامسان.

**پەنەمیو:** ئاوساو.

**پەنەمیگ:** پەغاو، ئاوساو.

**پەنەمین:** (هەورا.) ئاوسان. (ئەردە.) پەندەمووسکردن.

**پەنەواردەی** (هەورا.): دەرخوواردان.

**پەنەویارای** (هەورا.): پێوەستان، پێوێران، دەرەقەتهاتن.

**پەنبە** (باک.): ڕەنگی گوڵ، پەمبە.

**پەنبەیی:** سوورێکی کاڵە. گوڵێکی ئاڵە.

**پەنبوولە** (باک.): پەپوولە.

**پەنج:** پنج، پیودارو. لە قسڵ و لۆکەی کۆن و سپێنەی هێلکەی پێکدێ بۆ پینەکردنی گونج دیزە وگۆزە و کووپەڵەی شکاو. (ڕۆژ.، باک.) پێنج، بن ــ کردن: ئازادکردن.

**پەنجا:** پێنجا (٥٠).

**پەنجار** (باک.): ئەو گیایانەن، کە دەخورێن.

**پەنجاهەم:** چتێکە لە پلەی پەنجادابێ.

**پەنجاهەمین:** پەنجامین.

**پەنجایی:** دراوێکی زێوینە بە (٥٠) فلس دەچێ.

**پەنجە:** (دەر.، بابا.) قامک، تپل. پەنجەی دەست و پێیان، ماوەی پانی چووار قامکان. پەنج، (باک.) چیق. لە ــ دان: بەربەرەکانی کردن. ــ ی شێری: چەنگاڵ. (ئەردە.) چەمۆڵە.

**پەنجە تووتی** (هەورا.): قامکە تووتەڵە.

**پەنجەر:** پەنجەرە. چەند کونێکە لە تۆپی ئاش دەکرێ بۆ ئەوەی، کە زبانەی پەڕەی تێبخرێ. لەپ، ڕۆدە، پاچە (باک.). پێنج ڕێ، ڕەنگە لە سەرەتادا پەنجەرە (٥) دەرکی بوبێ بۆیە ناوی نراوە ــــ . چوارچێوەیێکی پڕ لە شووشەبەندە بۆ ڕووناکی ژووران لەناو دیواری دەخرێت. ــ ی چکۆڵە: مەرەد، ڕەواقە.

**پەنجەشەڕ** (باک.): جووری قوونێر و کولکێکە. شێرپەنجە، شێرپەنجە شەڕ.

**پەنجەشێر:** شێرپەنجە.

**پەنجەک:** پێنج خشتەکی، پێنج لک.

**پەنجەکەڵە** (دەر.): قامکەگەورە.

**پەنجەکێشی:** کوللێرەیەکی درێژۆکەیە، کە پەنجەی پێدا درابێ لە کاتی بە تەندوورەوەدانێدا بە چەشنێکیدا، کە جێگای پەنجەکان لە کوللێرەکەدا دیار بێ.

**پەنجەگۆشت** (باک.): نەرم.

**پەنجەم** (هەورا.): پێنجەم.

**پەنجەو دڵی ڕەسی** (هەورا.): قامکی نێوەڕاستیێ. پەنجەمەڵپێکان

**پەنجەی بالابەرزە:** قامکی نێوەڕاستیێ، زەڕنەقوتە.

**پەنجەی بێچارە:** کەیوان، هورمز، بارام، ناهید، سیوەیل (زحل، مشتەری، مریخ، زوهرە، عطارد).

**پەنجەی تار:** پەنجە دزیاگ، جێژنێکی کۆنی ئێرانیانە.

**پەنجەوانە:** (کە.، ڕۆژ.): دەستکێش، دەسکێش. (ڕۆژ.) قەیناغ، قامکوانەی تەنەکەی سەپانان. ئەنگوستیلە.

**پەنجەمەڵپێکان:** پەنجە تێکپەڕاندن.

**پەنجەی درپاگ:** پەنجەی ناز.

پەنجوانە

**پەنجەی مریەم:** گیایەکە وەکوو پەنجەی دەست وایە.

**پەنج چاوکەی دڵ:** پێنج گەنج، پێنج گەنجینە. پێنج چاوەی هۆش: هێزی دیتن، بیستن، بۆنکردن و چێژتن و دەست لێدان.

**پەنجەدەری:** وەتاغێکە، کە پێنج دەرکەی لە حەوشی یا لە دەرەوە دابێ.

**پەنج ڕۆژە:** پێنج ڕۆژەی جیهان، مەبەسی لە هەفتەیێکە بەڵان ڕۆژی بوون و مردنی تێدا فرێدراوە.

**پەنجک** (دەر.): قامک.

**پەنج گەنجینە:** پەنج چاوکەی دڵە.

**پەنجووڵە** (ئەردە.): چەپۆڵە، چەمۆڵە.

**پەنجی نار:** ئێلێکی کوردە گەورە و ناودارن لەناو (خەمزر) دایە (٧) باوکن، ماڵی (چەتۆ) بنەماڵەی (پەنجی نارا) بوون. بشاری چەتۆ و جەمیلی چەتۆ بەناوبانگن، بشار لە ١٩١٤دا لەشەڕیدا لە ئێرانێدا کوژراوە بەڵان جەمیل لە ١٩٢٥ دا بەدەستی ترکان کوژرا.

**پەنجیک:** پێنج یەک.

**پەنج** (باد.): چەنگاڵی دڕندانە.

**پەنچەر:** تایەو چووپی ئوتۆمبیل و بایسکل و چتیترە و کون بووبێ. ــ بوون: کون بوونی تایە و چووپی ئوتومبیل و بایسکل وچتیتر.

**پەنچک:** پەترۆک.

**پەند:** ئامۆژگاری، تەڕن، مۆچ، مووچیاری، ئامۆژیاری، ڕێنۆنی. بەڵا، گێچەڵ، ڕووشە، کارەسات، کەتن. ئەتک، هەتک، سەرکۆنە. بە ــ بردن: ناموس بردن.

**پەندەمووسکردن:** ووشەیەکە لە ڕووی قەشمەری و سووکییەوە بەیەکێکی نووستوو دەروترێ، بەنووستنی یەکێک دەڵێن پەندەمووس یا پەندەمووسکرد.

**پەندپێدان:** تەڕنکردن بە یەکێک، سەرکۆنەکردن.

**پەندی** (باک.): ئاشکرا، خویا، دیار.

**پەندیر** (دەر.): پەنیر.

**پەندیرە** (دەر.): پندر.

**پەنزێشکە:** نوسەنەکە، نوسەکە.

**پەنزەهار:** پەشۆکاو، شێواو، پەشێواو، تێکچوو لەبەر زۆری خەم و پەرۆشی.

**پەنسە:** کەلبەتانی گچکە.

**پەنشمە:** پێنجشەمە.

**پەنشەمە:** پێنجشەمە.

**پەنک** (باک.): ڕیسێکە لەسەر ماشەر هەڵکرابێ.

**پەنگ** (هەورا.): پشوو. پنگ، مەنگ، مەند. (موک.) ڕاوەستاو. ــ خوواردنەوە: پەنگاو خوواردنەوە، ئێتق خوواردنەوە، ڕاوەستان و گەڕانەوەی ئاو بەرەو دوواوە.

**پەنگاف** (باک.): پەنگاو، پۆنگاو.

**پەنگاف:** پەنگاو.

**پەنگان:** پەنگبوون. پۆنگان.

**پەنگانەوە:** پۆنگانەوە، پەنگ خوواردنەوە.

**پەنگاندنەوە:** پێشی ئاوگرتن، پنگاندنەوە.

**پەنگاو:** پەنگاف، پنگاف، گۆل، ئاوی مەند. ــ خوواردنەوەی ئاو: پەنگخوواردنەوە، پنگانەوە، ئێتق خوواردنەوە. (باک.) پەنگهین، پەنگان. بۆگەنبوون.

**پەنگەمووس:** پەنگڵەمێش.

**پەنگەمێش:** پەنگڵە مێش.

**پەنگەوخوواردن:** پەنگ خوواردنەوە.

**پەنگ ئەستێرە** (سۆر.): کرمێکە بە شەو قوونی دەدرەوشێ.

**پەنگ پێدان:** پەند پێدان.

**پەنگ خوواردنەوە:** پۆنگ خوواردنەوە.

**پەنگر** (ڕەوا.): پۆلوو، پشکۆ، ئاگر. (باک.) پەرەنەستێن، چتێکە ئەشرنەکری ونفوزی تێ نەکرێ.

**پەنگرکێش** (خۆ.، ڕەوا.): ماشە، مەقاش.

**پەنگرگر:** ماشە.

**پەنگزین** (باک.): هەڵبەزینەوەی تۆپ وئیتر.

**پەنگل:** پەنگر.

**پەنگڵەمێش** (ئەردە.): مان، پێش، ڕق، قین، پشم.

**پەنگل کێش:** پەنگرکێش، ماشە، مەقاش.

**پەنگهین** (باک.): بەهەوا، بەفیز. پەنگ خواردنەوەی ئاو.

**پەنمان** (فە.، بابا.): ئاوسان، هەڵامسان.

**پەنماو** (فە.، بابا.): ئاوساو، هەڵامساو.

**پەنمای:** هەڵامساو.

**پەنمیان:** هەڵامسان.

**پەنمیگ:** هەڵامساو، ماسیگ، هەڵاتگ، هەڵهاتگ.

**پەنمین:** هەڵامسان، ئاووسان. نوستن بە ڕکەوە، پەنگەمووسکردن.

**پەنوور:** پەنیرۆکە، پەنیرۆچکە. گیایەکە بۆ تفاقی زستانی وولاخان دەکرێتەوە گیشە.

**پەنهان:** نەدیو، چرۆنەک، نیان، پەنی، دەرکەنار، پۆشراو، داپۆشراو، نهێنی، وون، بزر، شاراوە، گوم. چتی وون و نادیار. ــ بوون: شاردرانەوە، گوم بوون، وون و بزربوون. ــ کردن: بزرکردن، حەشاردان.

**پەنهانی:** نیانی، بزری، نەدیوی، وونی. ئاخۆتنێکە یا کردارێکە بەنهێنی ئەنجام بدرێ.

**پەنی** (باد.): دیار، ئاشکرا. پلّ.

**پەنییەنی** (باد.): پلّپلّ.

**پەنێر:** پەنیر.

**پەنیر:** (دەر.) پەندیر. ـــ ی کولاّو: شێلیمۆک، برێتییە لە شیرێکی، کە پەیت و خەست بووبێ بەهۆی هەوێنێکی تایبەتیدا، هەوێنەکەی بەو چەشنەیە: کاکڵی شیلاووک(شیلاڤ)ی بەرخی یەکساڵی لەگەڵ سیر و خوێ ووشک دەکرێتەوەو هەڵدەگیرێ بۆ ساڵی دادێ.

**پەنیرە** (هەورا.): پەنیرۆکە. شیرەی دەنکی دەغڵییە، کە کەمێک پەیت بووبێ و بۆ هەموو شلەمەنییەکی بەکاردەبرێ، کە کەمێک پەیت بووبێ. تۆڵەکە.

**پەنیرگشت:** (خۆ.) پەنیرۆکە، پەنوور، پەنیرۆچکە. نێرتکی گیای کرتییە سپی و نەرم و شیرینە دەخورێ، بۆ تفاقی زستانی وولاّخان دەکرێتە گیشە.

**پەنیرۆچکە** (خۆ.): پەنیرگشت، پەنیرۆکە، پەنوور.

**پەنیرۆک** (هەو.): ئەوشیلەیەیە لە نێو شیلاوکێدایە. (باک.) پەنیرۆچکە، گیای پەنیرگشت.

**پەنیرۆکە:** پەنیرە. پندرو پەیت وتوند بۆ هەموو شلەمەنێکیش بەکاردەبرێ، کە ڕوو لە توندبو پەیتی بکات. گیایەکی گەلاّ باریکە گوڵێکی گچکە دەگرێ شیرەیێکی سپی تێدایە وەکوو پەنیری دەخورێ. گیایەکە بۆ تفاقی زستانی وولاّخان دەکرێتە گیشە گەلاّی باریکە. پەنوور، پەنیرۆچکە، پەنیرگشت.

**پەوکەی** (هەورا.): بۆیە، لەبەرئەوە.

**پەوچی** (ئەردە.): بۆ ئەوە، بۆ ئەمە.

**پەوکە:** بۆ ئەوە.

**پەوکی** (هەورا.): بۆیە، لۆیە، سەبارەت بەوە.

**پەوێنە:** بڕوانە: پەوینە.

**پەوینە** (فە.): پاوانە.

**پەهـ:** بەهـ، بەهبەهـ. بۆ سەرسوڕمان و بێزاری دەردەبڕێت.

**پەها:** بڕوانە: بەهـ.

**پەهپەهـ:** پەحپەح، پەح، بەهـ، بەهبەهـ.

**پەهت:** بڵێسە، گڕی ئاگر.

**پەهتن** (باک.، نەهـ.، شکا.): چێشت لێنان. بپەهتە.

**پەهتی** (باک.، نەهـ.، شکا.): نانی کراو. چێشتی لێنراو.

**پەهڤان** (باک.): قەرەوڵ، کێشکچی.

**پەهڤانی** (باک.): کێشکچێتی.

**پەهلەڤان** (باد.): پالّەوان، قارەمان.

**پەهلەڤانی** (باد.): پالّەوانی، قارەمانی.

**پەهلەو:** پالّەو، پەهلەوان، پالّۆ، پایەتەختی میرایەتی دومەل و زازایە.

**پەهلەوی:** ئەو کەسەیە، کە خەڵکی پالّە و پالّۆ بن، کە پایتەختی میرانی دومەل و زازان زۆر وێدەچێ، کە زازا و دومەل، دومبل پەهلەوی بن، چەشنی زاراوەی وانیش کۆنە و نزیکی زاراوەی هەورامییە. شارستانی.

**پەهلی** (فە.): خالّگە، تەنیشت، لاتەنیشت، کەلەکە.

**پەهن** (باد.): پان، بەرین.

**پەهناڤ** (باک.): زناو، باتلاّغ.

**پەهناندن** (باک.): پانکردنەوە.

**پەهنایی** (باک.): پانی، پەهنی، بەرینی.

**پەهنی** (باد.): پانیە، پانێ.

**پەهنین** (باک.): پان بوونەوە.

**پەهیز** (باک.): پاییز.

**پەهیزۆک** (باک.): جوورە گۆرانییەکی کوردییە لە کاتی تەشی ڕستنێدا بەکار دەبرێ.

**پەهین** (باک.): شەق، لەقە، لووشکە. ـــ دان: شەق و لەقە لێدان، هێرش بردن.

**پەی:** (هەورا.) بۆ، لۆ. ـــ تۆ: بۆ تۆ. (باک.) دووا، پاش، پشت. ـــ چوون: دوواکەوتن، شوێنکەوتن. پێ، لاق، پا. ـــ دان تەردێ: پێداگرتن. ـــ ژێ بەردان: وازلێهێنان، بەجێهێشتن. ـــ شوێن: پێ بردن: شوێن بردنەسەر. دۆن، ڕێگا. ـــ بردن: پێ زانین، دلّ بۆچوون، ڕێ بردنەسەر، شوێن هەڵگرتن. ڕەگی سپی. وورده دەماری لەش، کە بە هەموو ئەندامدا بلاّوبۆتەوە و جەمسەریشیان بەمێشکەوەیە. بن و بێخ، قوولّی بنی ئاوە. ـــ دان: لە ڕووباراندا پێ گەیشتنە زەوی بۆ پەڕینەوە.

**پەیا:** (بت.) پیاو، مرۆ. (باک.) پیادە. پەیدا. ـــ بوون: پەیدابوون. هاتنەخوار، دابەزین. ـــ کردن: پەیداکردن. دابەزاندن، هێنانە خووار.

**پەیاپەی:** یەک لە دووی یەکتری، بەبێ بڕانەوە، پەیدەرپەی، پەیتاپەیتا، زووزوو.

**پەیاخ:** (خۆ.) چۆماغ، کوتەک، خوترە، خوترمە. دارێکی ئەستوورە، کە بۆ شەڕی دەستبدات.

**پەیادە** (باک.): پیادە.

**پەیار** (باک.): پیادە.

**پەیاری** (باک.): پیادەیی، پیادە ڕۆیی، بە پێیان ڕۆیشتن.

**پەیام** (هەورا.): وەلاّم، پەیغام. دەنگ و باس.

**پەیامبەر:** تارشە، پەیغامبەر، پێغەمبەر. ـــ ی: تارشایی، پەیغامبەری، پێغەمبەرایەتی.

**پەیامنێر:** پەیغامنێر، وەلاّمنێر، کەسێکە وەلاّم و دەنگ و باس بەولاولادا بنێرێ.

**پەی بردن:** ڕێ بردن، ڕێ پێ بردن، پەی پێ بردن، گومان بردن.

**پەی پێبردن:** ڕێ پێ بردن.

**پەیت** (هەو.): خەست، توند، چڕکە.

**پەیتاپەی:** پەیدەرپەی.

**پەیتاپەیت:** (باک.) تم، تم و تم.

**پەیتاپەیتا:** پەیدەرپەی، خێراخێرا. پەستاپەستا.

**پەیت و پۆڕ** (ڕەوا.): توندوتۆڵ، گورج و گۆڵ لە کاراندا.

**پەیتووکە:** باڵندەییێکی زرنگ و توندوتۆڵە، کلک هەڵتەکێنە، کلک هەلسەنگێنە.

**پەیجە** (هەورا.): نەردیوان.

**پەیجۆ:** پەیخوواز، پەیدۆز، پشکێنە. کەسێکە بە شوێن دۆزینەوەی کەسێک یا چتێکەوە بگەڕێ.

**پەیجۆر:** (جا.، ئەردە.) پەیجۆ. بۆسە، مەڵاس، کەمین و کەلێن بۆ کار و لە ڕاوێیە. (هەورا.) بە شووێندا گەڕان، وەشووێن کەوتن.

**پەیجوور:** پەیجۆر.

**پەیجووری:** بە شووێندا گەڕان، وەدووی سۆراغ کەوتن، پشکنین.

**پەیجۆیی:** پەیدۆزی، پەیخووازی.

**پەیچەڵ:** وولاغێکە لە ڕۆیشتندا هەردوو ڕەفیسکەی پاشووی لێکبدات وەک وولاخی سەمەنگوڵ.

**پەیچێش** (هەورا.): بۆچی؟

**پەیخام:** پەیام، ڕاسپاردە.

**پەیخامبەر:** پێغەمبەر.

**پەیخامکیان** (هەورا.): پەیغامنێر.

**پەیخەمبەر:** پێغەمبەر. ــ ی: پێغەمبەری.

**پەیخوواز:** پەیدۆز، پەیجۆ. ــ ی: پەیجۆیی، پەیدۆزی.

**پەیدا:** (باک.) پەیا، دیار، ئاشکرا، پێدا. ــ بوون: سەرهەڵدان، دیاربوون، ئاشکرابوون، خویابوون. زان، لە دایکبوون. ــ کردن: پەیاکردن، خویاکردن، دۆزینەوە. بنگیری، بنجووری.

**پەیدابوون:** سەرهەڵدان، دیاربوون، ئاشکرابوون، خویابوون. لێ ــ : هۆدانەوە.

**پەیدابیەی** (هەورا.): پەیدابوون.

**پەیدان:** نەخۆشیەکە بە هۆی گرانی باری بۆوێنە لە پێی ئێستر سەرهەڵدەدات. پەیدان، بووار، بار. ڕێدانی شووێنێکە لەناو ڕووباراندا، کە مرۆ بتوانێ پێیدا بپەڕێتەوە.

**پەیدەرپەی:** هەیتاهەیتا. پەیتاپەیت، پەیاپەی، پەیتاپەیتا، خێراخێرا، (کە.) پەیتاپەی. بشێربشێر، (باک.) پێدە. (باک.) تم، تم وتم. لێکدالێکدا. بەبێ بڕانەوە.

**پەیدۆز:** پەیجۆ، پەیخوواز. ــ ی: پەیجۆیی، پەیخووازی.

**پەی دیوار:** بندیوار، لەپای دیوار.

**پەیر** (باک.): پەردە.

**پەیڕەو** (هەورا.): پەیڕۆ. کەسێکە لە گوفتار یا لە کردارێکیدا چاو لە یەکێکی تر بکات.

**پەیڕەوی** (هەورا.): پەیڕۆیی، چاوتێبڕین، چاو لێبڕین. ــ کردن: چاو لە ئاخۆتن و کردەوەی کەسێکی کردن.

**پەیڕۆ:** پەیڕەو. ــ یی: (هەورا.) پەیڕەوی.

**پەیروون:** پیرۆزە، بەردێکی نرخدارە. ناوی ئافرەتانە.

**پەیزەن:** مرۆ یا وولاخێکە لاق لێکبدەن، خۆی بنگێوێ، پاشوو نەنگێو. گیاندارێکە لە ڕێگا ڕۆیشتندا ئەگەر مرۆ بێ هەردووپێ بە جوورێکی لێکبدات، کە ڕەقەڵەی قولاپەی بریندار بێ خۆ ئەگەر وولاخ بێت هەردووک دەستی لێکبدات و دەستی بریندار بێ.

**پەیزەنی:** لاق لێکدان و خۆ ئەنگاوتنی مرۆ یا ماڵات و وولاخ.

**پەیژە** (بابا.): نەردیوان.

پەیژە

**پەیژۆ** (هەورا.): سەودا، دڵدارێتی. بەشووێندا گەڕان.

**پەیسەر:** پێوار، پشتەسەر، پاشملە.

**پەیسک** (باک.): پایە.

**پەیغام:** پەیام، وەڵام، نامیلکە، سۆراخ، پەیخام، ڕاسپاردە.

**پەیغامبەر:** پەیامبەر، پێغەمبەر، وەڵام هێنەر، سۆراخ و وەڵامدەر. ڕاسپێرراو. ــ ی: پەیامبەری، پێغەمبەری.

**پەیغەمبەر:** پەیغەمەر، پێغەمبەر.

**پەیڤ** (چی.): قسە، ڕستە، پەییڤ.

**پەیڤاندن** (باک.): ئاخافتن. وەدووانخستن.

**پەیڤتن** (باک.): ئاخۆتن، قسەکردن. بپەیڤە.

**پەیڤین** (باک.): قسەکردن.

**پەیک** (باک.): باسک. وەڵام، سۆراخ، پۆسە. چالاک، زیرەک. چەپەر، پۆستە، تەتەر، شاتر، نامەبەر، کەسێکە نامەی مەردوم بۆ ئەم و ئەو ببات. ئەستێرەییێکە لە هێزی کێشندەدا بە دووای ئەستێرەیەکی لەخۆی گەورەتر وەکوو مانگ بۆ زەوی. بەردەستێکی بچووکە هەمیشە لە گەورەکەی جودا نەبێتەوە.

**پەیکار:** شەڕ، جەنگ. دووای کار، شووێنی کار.

**پەیکان** : سەری تیر و ڕمییە، سەرە تیژەکەی ڕمب و نێزەیە.

**پەیکان چیوەدەس:** سەرە نێزە.

**پەیکان نێزە:** سەرە نێزە.

**پەیکاوەر** (باک.): پۆستەچی، پۆستەهێنەر، چەپەرچی. (باک.) ــ ی: پۆستەچێتی، چەپەرچێتی، پۆستەهێنان.

پەیکەر

**پەیکەر:** ڕوو، ڕوخسار، چارە، قەڵافەت، بەشەن. ئابیدە، کۆتەڵ.

**پەیکەرە:** ڕەوروشت، یاسا.

**پەیکەرتاش:** ئەو کەسەیە، کە پەیکەر دەتاشێ لە بەرد و ئاسن. ــ ی: پیشەی پەیکەرتاش.

**پەیکەرتراش:** بڕوانە: پەیکەرتاش. ــ ی: بڕوانە: پەیکەرتاشی.

**پەیکەرساز:** پەیکەرتاش. ــ ی: پەیکەرتاشی.

**پەیکردن:** بڕین و داهێنانی چتێک. پێ بڕینەوە.

**پەیکۆگەی** (هەورا.): بۆ کوورێندەرێ.

**پەیکوڵ:** پەیکوڵە.

**پەیکوڵە** (جا، ڕۆژ.، هەورا.): گیایەکە پەلکی وەهی نیسکی دەچێ، دڕوێکی خڕ دێنێ و بزن دەیخووا. قونجڕکە، پێکوڵە، زۆرتر لە نێو تووتن و شینایییدا دەڕوێت، مێملی تووتن و شینایییە.

**پەیکوڵەجاڕ** (ڕۆژ.): جێگایەکی وایە پەیکوڵەی زۆر بێ.

**پەیکۆی** (هەورا.): بۆ کووێ.

**پەیکۆی ملی** (هەورا.): بۆ کووێ دەچی.

**پەیمان:** بەڵێن، هەرتی، پێمان، هەرێ، بریە، ژووان، بەڵێن، بڕیار. **ـــ بەستن:** بەڵێندان، بڕیاردان، وەخۆگرتن، گرتنەبەر، ڕێککەوتن لە پەیماندا‌ریدا. **ـــ دان:** بەڵێندان، بڕیاردان و دخۆگرتن. **ـــ ڕاگر:** بەڵێن ڕاگر، (باک.) دەڤبگۆتن. **ـــ شکاندن:** بەڵێن شکاندن.

**پەیمانە:** بارە، کاسە، پەرداخ، کێس. پێوانە. پێوانەییێکە بۆ پێوانی دانەوێڵە بە مەن و کەویژ و چتی تر، ئەیار.

**پەین:** پەیین، تەرسی ووشک. (هەورا.) سەنێر.

**پەینە** (هەورا.): پەین.

**پەی نەبوون:** بێ بن، قوول.

**پەی نەدان:** پانەدانی ڕووبار و ئاوان بۆ پەڕینەوە.

**پەیینگا:** سەرگووێلک، گوفەک.

**پەیینکە** (ئەردە.): ئاردێکە لەسەر کەوڵی بڵاوەدەکەنەوە تا هەویرە تەنگوتکی پێوە نەنووسێ.

**پەیوەس:** پەیوەست.

**پەیوەست:** چتێکە، کە بە چتێکی ترەوە نووسابێ. **ـــ بوون:** پێکەوە نووسانی چتێک بە چتێکی ترەوە و یا گەیشتنەوە یەکتری. **ـــ کردن:** پێکەوەنووساندن و یا گەیاندنەوە دوو یا چەند چتێک بەیەکتری.

**پەیوەستە** (باک.): منداڵی حەوتساڵانەیە.

**پەیوەستی:** پەیوەندی. ئامرازی پەیوەندی.

**پەیوەن:** پەیوەند.

**پەیوەند:** بەندیوار، پەیوەست، فتروونە، پێوەند. **ـــ کردن:** پێوەندکردن. موتربە کردنی دارێک لە دارێکی بەری تر. چووزەکردنی درەختێک لە درەختێکی تر.

**پەیوەندی:** سەروکار، ئاشنایی. بەندیواری.

**پەیوێت** (هەورا.): بۆ خۆت.

**پەیویرستن** (دەر.): پێوەستان، دەرەقەتهاتن، پێ ڕێران.

**پەییز:** پاییز.

**پەییڤ:** بڕوانە: پەیڤ.

**پەیین:** تەرسەقول، قەرسەقول، تەرسی وولاخی بەرزەیە.

**پەیینجە** (ئەردە.): نێردیوان.

**پەیینجی:** کەسێکە، کە هەر پەیین کۆبکاتەوە بۆ سووختی گەرماو و ئیتر.

**پەیینکە:** ئاردێکە دەکرێ بە گونکەوە لە کاتی کردنەوەیدا بە نان تا بەدەست و تیرۆکەوە نەنووسێ.

**پەیینکێش:** پەیینچی، توونەوان.

**پیاخ:** پەپاخ.

**پت:** (موک.) نەخت، تۆز، چک، قیچ، کەم، هێچ. **ـــ یێک:** تۆزێک، کەمێک. ئەوەندەیە، کە بە سەری دوو قامکان هەڵگیرێ لە ئارد و خووێ و ئیتر. پتە، پەلەپیتکە، بەپشتی پەنجەی دەست لە چتێک بدرێ. (زرا.، ڕۆژ.، لو.) لووت، کەپۆ: دایە پتیا. قامک، تپل. پتە بە قامکی شادە و گەورە لە گووپی کەسێکیدان، (هەورا.) پلتۆک. (باک.) ژیکەڵە، چکۆڵە، قشتیلە، جووان. خۆشەویست، نازدار. بۆ ژن، ئافرەت بەکاردەبرێ بە تایبەتی بۆ ژنی خۆی بە عەرەبی لە جیاتی پتێ دەڵێن عزیزەتی. (ساڵە.) ناوی قوون، کۆم. **چل: ـــ دان:** چڵدان. (زا.) نوختە.

**پتاپت** (زا.): پسەپسکردن.

**پتات:** زۆر بێژی پڕووپووچ.

**پتە:** پت، پرتە.

**پتەپت:** پرتەپرت.

**پتەو:** قایم، ڕەق، مەحکەم، (دەر.) پەختە. قورس، مایەدار. پەستراو، دووباد، سفت، پەسیاگ، تاتپکێت، کەماچ، خووەشکێش، تەوورت. مەیلەو ووشک، کزر، پندر. **ـــ ی:** قایمی، ڕەقی، سفتی، قورسی.

**پتیت** (باک.): خاڵکوتان. پتەپت، پرتەپرت.

**پتیتووک** (زا.): چتێکە، کە چەند خاڵێکی ڕەنگاوڕەنگی پێوەبێ.

**پتدان:** چڵدان.

**پتر:** پرتر، پێتر، (باک.) زەهفتر. (باک.) پەرە، بهتر، بێتر، پێتر. زۆرتر، گەلێکجار. فرەجار. **ـــ بوون:** پەرەسەندن. نیتر، نیدی، نیکە.

**پتروو** (ئەردە.): پەترۆک، پترووخە.

**پترووخە** (ئەردە.): قەتاغەی سەربرینان.

**پترووکە** (ئەردە.): پەترۆک.

**پتری:** بێتلش، پراهی، (باک.) پرانی.

**پتشخووار:** کوردان لە پێش ساسانیە فەیلیەکاندا بەکێو و چیایانیان گوتووە **ـــ**.

**پتشخۆر:** ئازناوی ئەو کەسەبوو لە پێش ئیسلامەتیدا، کە لە دەرباری پادشایەکانی کورداندا لە پێش پادشادا خۆراکی خواردبێ. پێشخوور، پێشمەرگە.

**پتک:** شەمچە، لێخرێنە، شخارتە. (خۆ.) قامک، تپل، تلی. (ئەردە.) پەلەپیتکە، moorە، خیرە.

**پتکە:** پرتکە قورێک یا پیسایێک.

**پتکۆ** (باک.): پت، قشتیلە، جووان، چکۆڵە، ژیکەڵە. ژن، ئافرەت.

**پتلیوی** (گۆ.): قامک.

**پتۆت:** گیایەکی هاوینییە پنجی گەورەیە تا دووبستان بڵند دەبێ گەڵایەکانی وورد و چکۆڵە و خڕن و شینێکی پڕ ڕەنگە، جلک و بەنی پێ ڕەشدەکەن. ڕەشکی بە پتۆتی داک ناگاتە دژتی. پتۆت گوڵی بە تۆپەو بە سوور دەنوێنێ لەبنەوە لکان ناداتا شیرەکەش و گیایەکەشی زۆر تاڵن، شیرەکەی چەند جارێکی لە چاوی تانەدار کرێ چاکی دەکاتەوە، تاسالێکیش هەڵدەگیرێ، شیرەکەی بەسەر کلۆشەکریدا بکرێ و هەڵبگیرێ باشە.

**پتووپۆز:** بڕوانە: پتووپووز.

**پتووپووز** (ئەردە.): دەم و کاوێژ، دەم و پەوچ، دەم فلچ.

**پتووپاوزگ:** پرێسکە.

**پتوورکەو** (کرما.): دارزاو، لەناوچوو.

**پتی** (باک.): گچکە، ناوی پیاوێکییە. (خۆ.) ئافرەتێکی بێ سەرەوبەرەیە، پیس و پۆخڵ.

**پتیک** (ئەردە.): پەلەپیتکە، مووره، خیرە.

**پتیله** (لۆ.): پلیتە.

**پتیوار:** پایەماڵ، خراپ و کاوول و پاماڵ. ـــ بوون: کاوول بوون، پاماڵ بوون. ـــ کردن: کاوولکردن، پایەماڵکردن.

**پچ** (ڕژ.): جک، کەم، تۆز، نەخت. ـــ یک: تۆزێک، نەختێک. (باک.) گچکە، پارچە.

**پچاندن** (ئەردە.): چپەکردن، بە بنگوێ گوتن، بە سرتە ڕاگەیاندن.

**پچە** (ڕژ.): سرتە، سرکە، چپە، چرچە، چتە، فتە.

**پچەڕان:** پسان، پرچیان، چریان، پچڕان، پچکڕان، پرچان.

**پچەڕاندن:** پچکڕاندن، پساندن، پرچاندن، چرپاندن، (باک.) پشکووراندن.

**پچەڕاو:** پچڕاو، پساو.

**پچەپچ** (ڕژ.): چپەچپ، سرتە سرت، سرکە سرک، ووتووێژی ئەسپایی، پەیڤی نهێنی، کەین و بەین.

**پچەپچەڕ:** پارچەپارچە، تیکە تیکە، پچڕپچڕ، گێرەوکێشە. ـــ بوو لە سەرفیسارەکەس، دژواری و سەختی.

**پچپچ:** ترشان؛ هەڤیرێ م ـــ یە یانی گەلێک ترش بووە، واتا ترشاوەو هەڵاتووە.

**پچڕ:** پساو، چتێک، کە بەردەوام نەبێت.

**پچڕان:** پچکران، پچەڕان، کەرتبوون، تێل، پسانی گیاندار.

**پچڕانەوە:** پچەڕانەوە،پچکرانەوە.

**پچڕاندن:** پچڕاندن.

**پچڕاندن:** پچڕین.

**پچڕاو:** پچەڕاو، پساو.

**پچڕاوە:** پچەڕاو، چتێکە پچەڕابێ.

**پچڕپچڕ:** چتێکە لە گەلێ لاوە پچڕابێ، بڕکەبڕکە، تیکەتیکە، قسەی بڕبڕ. کردەوەیەکە، کە سەروبەر نەبێ. کارەکەت ـــ ە: واتە سەروبەرنییە.

**پچڕک** (باد.): کولێرەی ناوشکێنە.

**پچڕۆک:** چتێکە زوو بپچڕێ.

**پچڕیاگ** (ئەردە.): پچڕاو.

**پچڕیان** (ئەردە.): پچڕان.

**پچڕین:** پچەڕین، پچکرین، لێکردنەوەی چتێک لە چتێک بەنهێم، پرچانن، پچڕانن.

**پچڕینەوە:** پچەڕینەوە، بردانی یەکێک لە یەکێک یا لە چتێک، شاڵاو و پەلامار بردنەسەر یەکێک و ڕنینەوەی ئەندامی، ئەستاندنی چتێک لە کەسێک بە زۆر.

**پچک** (باک.): پیچێک، کەمێک، نەختێک، وورد. ـــ کردن: ووردوخاشکردن.

**پچکان** (ڕژ.): ڕزان، پسان، پچڕان، داوەشان.

**پچکاندن** (باک.): کەمکردنەوە، کەمکەمەکردن، پساندن.

**پچکانراو** (ڕژ.): پسێنراو، پچکڕێنراو، ووردوخاشکراو.

**پچکاوە** (ڕژ.): ووردوخاشکراو، تەنها بۆ پەنیرو چتی وا بەکاردەبرێ. پساو، بزرکاوە، پچڕاوە، ڕێنراوە.

**پچکەڵە:** چکۆڵە.

**پچک پچک** (باک.): کەمکەمە، پیچپیچە.

**پچکڕان:** پچەڕان، پچڕان.

**پچکڕاندن:** پچەڕاندن، پچکڕاندن، (باک.) بشکووڕاندن.

**پچکڕاو:** پچڕاو، پچەڕاو، پساو.

**پچکڕێن:** پچەڕێن، پسێن، ئەو کەسەیە چتی بپچڕێنێ.

**پچکڕین:** پچەڕین، پچڕین، بشکووڕین.

**پچکڕینەوە:** پچەڕینەوە، پچڕینەوە.

**پچکڕێنراو:** پچکانراو، پسێنراو.

**پچکۆک** (باک.): کەمێک.

**پچکۆڵ:** پچکۆڵە.

**پچکۆلانە:** چتی زۆر بچووک.

**پچکۆڵە:** چتی زۆر گچکە.

**پچکین** (باک.): بێجگە، کەمبوونەوە.

**پچووک:** کەمین، گچکە، چکۆڵە، منداڵ، بۆچک، (دەر.) گوڵاڵە. ـــ بوونەوە: گچکەبوونەوە. ـــ کردنەوە: گچکەکردنەوە.

**پچووکاهی** (باک.): بچووکێتی، منداڵێتی.

**پچووکی:** گچکەیی، منداڵی، خووداردەستی، ژێردەستی.

**پچێ** (ڕژ.): کەمێ، نەختێ، هەندێ، تۆزێ.

**پچین** (باک.): شەق تێهەڵدان.

**پخ** (باک.): زویری، ڕق، قین، کین، پشم.

**پخ:** پرخە، دەنگی کەسێکی نوستووە. دەنگێکە بۆ ترساندنی منداڵان لە شوێنێکی نهێنیدا بەکاردەبرێ لە ناکاودا. دەنگێکە بۆ ڕەواندنەوەی ئاژاڵ و ماڵاتان بەکاردەبرێ. ـــ کردن: بەپێ ی زاراوەی منداڵان بڕێتییە لە سەر بڕین. چتی جووان، پەخ، پخە.

**پخە** (ڕژ.): پخ. پەخ، پەخە، چتی جووان، کە چتێک بە جووانی نیشانی منداڵان بدرێ پێیان دەڵێن (پخە) یە.

**پخەخ:** دەنگێکە بۆ ترساندنی منداڵان بەکاردەبرێ لە شوێنێکی نەدیودا. بۆ ڕەواندنەوەی ئاژاڵ و ماڵاتانیش بەکاردەبرێ.

**پخک:** پخ.

**پخەکردن:** بڕینی شت بەگردە، خشت بڕینی چت. سەر بڕینی پەڕەوور و ئاژاڵ لە زاراوەی منداڵاندا.

**پدۆ:** بروانە: پدوو.

**پدوو** (هەو.، باک.): پووک، پدی.

**پدی** (باک.): پووک، پدوو، پدۆ.

**پر** (باک.): پرد.

**پڕ** (موک.): داگیراو، ئاخنراو، تێ ئاخنراو. تەژی، تژی، کەیل، تراز، تیکمە، دەفر یا چۆڵاییێکە لە لێوان لێو چتی تێدابێ. ـــ بوون: تژی بوون، لێوان لێو بوونی چتێک. ـــ کردن: تژی کردن، سیلەکرن، هەشاندن، ڕتماندن، داردابیکردن، ترازکردن. ـــ کردنی جەواڵ: داگرتن، ڕتماندن. (باک.): زۆر، گەلێک. ـــ زان: زۆر زانا. نەکاو، لەناکاو. لە ـــ : لە

ناکاو، لە نەکاو. ـــ پێ بردن: دەرەقەتهاتن. چتی سفت: ئەو قالّبیەتانەی زۆر پڕە واتا سفتە، سفت، پتەو. خاوەند، خێوی، خودان. ـــ زۆر: زۆردار. پڕجۆش: جۆشدار. ـــ هونەر: هونەرمەند. بڕ، زات. ـــ کێشان: بڕکردن، ڕووهێنان، زاتکردن، ڕووهەڵاوێژتن.

**پراش** (ئەردە.): پەراش، ووردوخاش. ـــ کردن: ووردوخاشکردن.

**پراش پراش**: ووردوخاش.

**پرانی** (باک.): زۆرتر، پتر، پیتر، پراهی. ـــ ا وان: پتری ئەوان.

**پراوپڕ**: پڕبەپڕ، لێوالێوبوون، تەواو پڕ.

**پرە**: فرە، پیرە.

**پرەپر**: دەنگە. فرەفر.

**پرەنگ** (باک.): خوو، ڕەووشت، پیشە.

**پرەنگاندن** (باک.): خووپێگرتن، ڕاهێنان، ڕامکردن. بپرەنگێنە: ڕامکە.

**پرەنگین**: خووپێگرتن، ڕاهاتن، هۆگربوون.

**پرەووبووگ**: پڕبووەوە.

**پرەوەبوون** (ئەردە.): پڕبوونەوە.

**پرەوکردن**: پڕکردن، دڵپڕکردن، هاندان، فیتدان.

**پربار**: دارێکە بەری زۆر بێ، پڕبەر. دەغلی قەڵەو.

**پڕبەپڕ**: پڕاوپڕ.

**پڕبەدڵ**: لە کانگی دڵەوە.

**پڕبەر**: پڕبار، پڕبەهرە، بەردار، باردار.

**پڕبەلک** (باک.): چڕ و پڕ و تێکەڵاو، دارستان و گیا.

**پڕبەها**: نرخدار، بەهادار، زۆر بەبەها.

**پڕبوون**: تژی بوونی حەوز و ئەستێل لە ئاو. ئاووس بوونی ئافرەت و ماڵات.

**پڕبوونەوە**: لێوالێوبوونی ئامان یا دەفرێک بەرەبەرە. تێر خواردن و داکەوتن.

**پڕبێژ**: زۆر بڵێ، چەنە سووک، چەنەباز، سازندە. ـــ ی: زۆر بڵێیی، چەنەبازی.

**پرپا** (ڕۆژ.): پرپێ.

**پرپار** (باک.): پڕپرە (گیایەکە).

**پرپە** (باد.): هەزارپێ.

**پرپڕ**: لێوڕێژ، تێکمە، لچان، لیپان.

**پرپرە**: گیایەکە، (ڕەوا.) پڵپینە. (خۆ.) پرپینە، گەپرۆکە، (سوور.) پەرپینە، (دەر.) پەڵپینە، چۆچە، گیایەکە، کەسێکی، کە هەتاو بردبێتی خۆی پێبشوا و بیخوا پڕسوودە. جوورە خشڵێکە، پلپلەی زێڕ یا زیوی ئێخەی کۆلۆجان و گوارە پڕ گوڵی. پلپلە، بەرپینە، پرپرۆک، پەرەنگ.

**پرپرس** (باک.): ڕاز ڕانەگر، چاف زێلک، ئاشنا، ئاوێزە.

**پرپرۆک** (باک.): پڕپرەی زێڕ یا زیوە.

**پرپریک** (باک.) پەپوولە. (زا.) گیایەکی بەهارییە.

**پرپزەک** (باک.): گیایەکە.

**پرپش** (باک.): زیندەوارێکی پێ زۆرە لە شووێنانی سێبەردار و تەڕدا دەژی.

**پرپۆل** (ڕۆژ.): نێومال. پارچەی کۆنی شڕ، تیتۆل. مرۆڤی بێ کەلک و چەپەل.

**پرپۆڵە**: ئارد و ئاو بە تێکەڵاوی دەکرێتە گرمۆڵە گرمۆڵە، دەیدەن بە جووجکەی مریشکان چونکوو جووجیلە، کە تازە لە هێلکە بێتەدەرێ دانی بۆ قووت نادرێ.

**پرپێ**: پرپا. پێلاوێکە نە گەورەو نە گچکە بێ بەڵکوو کوتوومت پڕ بەپێ بێت. (باد.) هەزارپێ.

**پرپیاکردن**: پەپێداکردن، پردان.

**پرپێداکردن**: پرپیاکردن، تێرۆهاتن، لە پڕافراندن، پردان.

**پرپیشە**: پیشەدار، خاوەند کارێکی زۆر.

**پرپینە** (سوور.): (دەر.) پەڵپینە، پرپرە، گیایەکە دەخورێ.

**پرت**: (ڕەوا.) نەخت، تۆز، چک، پیچ. ـــ ێک: نەختێک. ووردە تووکی باڵندانە، پەڕی باڵندان، گەندە تووک. (باک.) دەنگی فڕەی باڵی باڵندانە؛ چووک گۆ پرت و فڕیا: چۆلەکە پرتەی کرد و فڕی. (باک.) تڕ. (باک.) قەڵەو.

**پرتاپرتا**: ڕاکردنی یەک لە دووای یەکتری بە پرتەپرت.

**پرتاف**: پرتاو، ئاوڕێژتن، تووڕدان.

**پرتافاندن**: فڕێدان. تاراندن، تەرەدووانیان، ڕاونان.

**پرتافیان**: بڕوانە: پرتافیان.

**پرتافین**: ڕاکردن، دەرچوون، هەڵاتن.

**پرتاڵ**: ڕینگۆڵ، پرتۆڵ، ڕینەدۆڵ، پرتووکار، پارچەی شڕ، پرتک، پرویتاڵ، پرچک، (سەق.) پرتۆک، کۆنە. (باد.، فە.) کەل و پەل، کووتاڵ.

**پرتاڵە** (ڕەوا.): هێشووە ترێی دەنک بڵاو.

**پرتاندن**: قرتاندن، فلتاندن، پۆلاندن.

**پرتاو**: ڕکێف کوت، بە تالووکە، بە هەڵەداوان، غار. ـــ کردن: بە پەلە غاردانی ووڵاخی سوواری.

**پرتە**: پرتەپرت، مرتە، جنگە، فرتە، فلتە، بۆڵە، قرتە، پتە، پندە، بۆڵە، کوتە. لێدانی دەمار. جوولانەوەی گڕی چرا.

**پرتەپرت**: مرتەمرت، پندە، کوتەکوت، گۆتەگۆت، جرتەجرت، جنگەجنگ، پندەپند، بۆڵە بۆڵ بە ژێر لێوانەوە، ئاخەفتن لەخۆوە، ڕنگەرنگ، پتەپت، پستەپست، فلتەفلت، (دەر.) ترمەترم.

**پرتەقاڵ**: نارنج.

**پرتەقاڵی**: ڕەنگی پرتەقاڵی.

**پرتەقاندن**: (باک.) فلیقاندنەوە، پرچکاندن.

**پرتەو** (هەورا.): ڕووناکی. تروسکە، ڕەوشنایی.

**پرت پرتە** (هەو.): ووردە برنج.

**پرتدان** (ئەردە.): پەرتدان، فڕێدان.

**پرتر** (باک.): پتر.

**پرتک**: جل و بەرگی کۆن، کۆنە، پڕوپیتاڵ. گەندەتووک، پەڕە ووردەکانی باڵندانە. پارچەیێکی گچکەی پیسایی مرۆڤانە.

**پرتکان**: پرچکان.

**پرتکاندن**: پرچکاندن، ئاوەڕووتکردن، پەڕ و تووک لە باڵندە کردنەوە. بپرتکینە.

**پرتکاو**: پرچکاو.

**پرتکە**: پنتک، پارچە پیسایێکی مرۆیانە. پارچە، ووردەی چت.

**پرتکەپرتک**: پارچەپارچە، ووردەوورده.

**پرتک پرتک**: پارچەپارچە. پارچەپارچە پیسایی مرۆیان.

**پرتکردن** (ئەردە.): فڕێدان.

**پرتکیان** (جا.): ڕزین، تولانەوە.

**پرتکین** (باک.): (باک.) پرچکین. ئاوەڕووتکران.

**پەرت وپەلا** (ئەردە.): چتی هیچ و پووچی بلاوبووەوەی ناوماڵ، هیچ و پووچ.

**پرتۆک**: کۆکەرەوە و بلاوکەرەوەی پیتانی چاپخانە. (سەق.) ڕندۆڵ، پارچەی شڕ، کۆنە، تیتۆڵ، پرتووکاو.

**پرتووکان**: قەمان، ران.

**پرتووکاندن**: قەماندن، بردن.

**پرتووکاو** (هەورا.): کۆنە، شڕە، پرتۆک.

**پرتووکە** (ئەردە.): پرتکە، قرتکە، پارچەیێکی گچکە.

**پرتووکیاگ** (ئەردە.): چتی پەواو، ڕزیو، کۆن، لە کار کەوتوو.

**پرتووکیان** (ئەردە.): پووا و، ڕزان، کۆنبوون، لە کارکەوتن.

**پرتۆڵ**: کۆنە، جلکی شڕ و کۆن، ڕندۆڵ، تیتۆڵ، پرتۆک. (باک.) ئەنجام، جەخەر، پەرتاڵ، کار.

**پرتوێژی** (ئەردە.): قسەی شاش و وێشکردن.

**پرتی**: (خۆ.) لۆکە، پارچەیێکی پێکەوەنووساوی لۆکەیە. (باک.) کومتاڵ. (ڕەوا.) تیسکی لۆکەیە.

**پرچ**: کەزی، گیس (فە.، دەر.)، (کەل.) پەلکە، (فە.) هوون، قژ، بە هەموو تووکی سەری ئافرەتان دەڵێن، کە لەلای پشتەوە شۆڕببێتەوە. ـــ ی بە کرووزە: پرچی بە گوریزە، پۆر هەلەک. ـــ ی هۆنراوەوە: (فە.) هوون.

**پرچاگەنم شامی**: ڕیشووی گوڵە پێغەمبەرە.

**پرچان** (باد.): پچەڕان.

**پرچاندن**: پچەڕاندن.

**پرچانن** (ئەردە.): قرتاندن، پچڕین، بڕین، پساندن.

**پرچە**: (باک.) فرچە، فلچە، پرچۆک. قەلەمی مەو. (ئەردە.) قرتە، دەنگی پسانی گوریس.

**پرچەک**: چەکدار، کەسێکە چەکێکی تەواوی پێ بێ. ـــ کردن: چەکاندن، چەکدار کردن. ـــ ی: چەکداری.

**پرچەنە**: چەنە درێژ، زۆر بلێ.

**پرچقان**: فلیقانەوە، جیق دەرهاتن.

**پرچقاندن** (گژ.، ڕۆژ.، یەز.، زا.): فلیقاندنەوە، جیق دەرهێنان. جلک و کەل وپەلی تەڕ کوشین.

**پرچقاو**: فلیقاوەوە.

**پرچک**: پنچک. ئەو دارە کورتانەن، کە لق و پۆپیان زۆرە. (سەق.) تیتۆل، ڕیندۆڵ، کۆنە، پارچەی شڕ، (دەر.) ڕینگۆوڵ. (باک.) پرژ، پرپشکی ئاوێیە. (دەر.) تیسی لکێکی گچکە و باریکی نینۆک یا گۆشتی لەشی مرۆڤییە، کە بگاتە گۆشتی زیندوو.

**پرچکان** (باک.): ئاوەڕووتکران، ڕنرانەوە، تووک و پەرلێکردنەوە.

**پرچن**: قژن، قژدار، پرچنە، قژنە، کەسێکە پرچێکی زۆر و ناشیرینی هەبێ.

**پرچنە** (ئەردە.): پرچن.

**پرچۆک** (باک.): پرچە، فرچە، فلچە، قەڵەمی مەو.

**پرچۆکە**: ئاڵەکۆک، هاڵەکۆک، گیایەکی بەهارییە و دەخورێ.

**پرچیان** (زێ.): پچڕان، پسان.

**پرخاندن**: پرخەپرخکردن لە خەوێدا.

**پرخە**: مرخە، (باک.) خپە، خرخر. هەستێکە لە دەم و لووتی مرۆی نوستوو دێ.

**پرخەپرخ**: خپەخپ، خرخر، پرخە، مرخەمرخ، پرخەی یەک لەدووای یەکتری، دەنگێکە لە کەپۆ و زاری مرۆی نوستوودێ. ـــ کردن: پرخاندن.

**پرخن**: کەسێکە لە خەوێدا بپرخێنێ.

**پرخ و هوور**: دەنگی پرخەپرخی زۆر.

**پەرد**: پر، پیل، چتێکی ناسراوە کە لەسەر جۆگە و چۆم و زێیان دروستدەکرێ بۆ ئەوەی، کە گیان لەبەران بە سەری بپەڕنەوە.

**پردان**: پرپێداکردن، تێڕۆهاتن، ئەوین.

**پەردەباز**: (باک.) بهۆز. (دەر.) بەردەباز، پێ بازگ، بازگە، چەند بەردێکن بەرێزە و کەمێک لێک دوور لە نێو ئاوێدا دادەنرێن، کە سەریان دیار بێ بۆ ئەوەی بۆ پەڕینەوە بە سەریدا بازبدەن.

**پردەڵە** (بابا.): چەند دارێکە لەسەر (خەردار) ی ئاش ڕایەڵ دەکرێن و بەرداشیان لەسەر دادەنرێ. دارێکی درێژە لەسەر دوو سینگ دا کوتراوە لە ئاوەندی (مۆلەقە) و (ئەوەرد) دا ڕایەڵی جۆلای ڕاگیر دەکات تا کارەکەی لار و خوار نەبێت.

**پردژ** (ئەردە.): ووچان، دەسترەس.

**پردڵ**: پر بەدڵ. ئازا، چاو نەترس.

**پردوو** (ئەردە.): پەردوو، ئەو زەل و هەژگ و هەژاڵەیە، کە لە سەرداری دارەڕای خانوو دادەنرێت و گڵەبانی لەسەر دەکرێت.

**پردووخیاگ** (ئەردە.): هەڵپرووزاو، پرووزیاگ.

**پردووخیان** (ئەردە.): هەڵپرووزان، پرووزان.

**پردۆکە** (هەو.): دوو پارچە دارن لەنێو کەرستەی جەنجەڕیدایە.

**پردێ**: شارۆچکەیەکە لە کوردستانی گەرمێنیدا کەوتۆتە نێوانی کەرکوک و هەولێرێ.

**پری مەلا وسوو شێخان**: پردی میرییە کەوتۆتە لای ڕۆژاوای کاولۆکان.

**پردی** (هەورا.): پرد.

**پردی میران:** دینەوەر.

**پردی بەرسرین:** پردێکە لە بەرد دروستکراوە لە سەردەمی میرییەوە سێ پێپیزە (دینگە)ی هەیە کەوتۆتە لای بەرسیرین و دۆڵێکی لەنێوان چیای مامەڕووت و سێلم دا.

**پردی وارە کەونێ:** کەوتۆتە گوندی وارەکۆنێ و نزیک ئەو دۆڵەیە، کە دەکەوێتە نێوانی چیای کارژخ و بستێ.

**پڕڕوو:** ڕوودار. ــ ی: ڕووداری.

**پردی خەلکانێ:** لەگوندی خەلەکانێیە بەرانبەری ئەو دۆڵەیە، کە لە نێوانی کلکی چیای هەندرێن و زۆزکدایە.

**پردی کاولۆکان:** کەوتۆتە لای ڕۆژاوای کاولۆکان (ڕەواندزی کۆن)، پردی مەلاوروسویی شێخان.

**پرز:** تووک، کوڵک.

**پرزانگ** (باک.): دوگمە. پزدان.

**پرزە:** هێز، تین، گوڕ، تاو، بڕ. ــ ی بڕی: هێز و تینی بڕی. هەست، خوست، دەنگ، هەناسە. ــ لە خۆبڕین: خۆ بێ هەست و خوستکردن. بەهانە، پەڵپ، هەلاتگە. دەرفەت، هەل.

**پرزە بڕاو:** هێز تێیدا نەماو، پەڵپ بڕاو. تەنگە نەفەسی. کەسێکە زیانێکی زۆری لێکەوتبێ.

**پرزە بڕین:** هێز و توانا بڕین. تەنگاوکردن.

**پرزک** (باک.): لوو، سۆ، برین و زیپکەی ئەندام.

**پڕزۆر:** زۆردار.

**پڕزوور:** زۆردار. تێکچڕژاو لە (مێشە، کشتوکاڵ).

**پڕزۆڵ:** پارچە، ڕمیزە، کەم، زیواڵ.

**پرزۆڵە:** پێچەک، شڕوپڕ، پاترۆتک، پارچە، زیواڵ، پەترۆک. پرزۆڵ.

**پرزوومو:** مووی ئاڵۆز.

**پرژ:** کەڵوەز، کەڵپەز، شیرۆ، ئاوڕێژ، ئاوڕێژگە، تاڤ، (دەر.) شۆڕاوە، قەڵوەز، قەڵبەز، (هەورا.) تاڤگە. (باک.) ئێوور، بەرکەمی، (زرا.) شۆش، پلووسک، ڕێژاو، ڕێژگە. پڕی چت، تەرز (توولە) ی سەوزایی وەکوو مێو و لاولاو وترۆزی. پەڕش و بلاو. (هەورا.) پڕیشکی ئاووری.

**پرژان:** پژان، پڕشان، بلاوبوونەوە، ڕژان.

**پرژاندن:** پژاندن، پڕشاندن. ڕژتن، بلاوکردنەوە.

**پرژوبلاو:** پەرژوبلاو، پەخش و بلاو، پڕش و بلاو، پەڕش و بلاو، (دەر.) پشاو. ــ کردن: پشاندن.

**پرژۆڵ:** پڕی چت، برژۆڵ.

**پرس:** پرسیار، داواکردنی زانینی چتێک. ــ خووە بسووندا کشاندن: وەدرۆ خستنەوە. ــ پێ کردن: پرس پێخستن، ڕا وەرگرتن. ــ پێ قەگەڕاندن: وەلامدانەوە، وەدرۆخستنەوە. ــ دان هەڤ: بە گوێی یەکتر کردن، یەکێتی. ــ درێژکرن: پێداگرتن. ــ لێکرن، پرسا ژ یکرن: لێپرسین، پرسیار لێکردن. لێ ــ: پرسیارکەر. لێ ــ ەوە: پرسیار لێکردن. بێ ــ: خۆکرد، خۆکردی. ڕاستەوخۆ.

**پرسا** (ئەردە.): کەسێکە دووای چت بکەوێ بۆ زانین، سۆراخکار، پرسیارکار.

**پرسانە** (ئەردە.): چتێکە لە کاتی پرسەدا بۆ ماڵی مردوو دەبرێ.

**پرساندن:** پرسیارلێکردن، پرس ژیکرن. بپرسینە: پرسیاری لێبکە.

**پرسە:** پەرسە. سەرەخۆشی کردن لە ماڵی مردوو، شیوەنگا. (ڕۆژ.، هەورا.، جا.، بابا.، هەو.) بانگ، سەرەخۆشی، تازیە، تازیانە، مۆداری، ماتەمداری، مەردە، (باک.) بنهاری. لە نەخۆش پرسین، پرسیاری نەخۆشان.

**پرسەدار:** مردوو لێ مردوو، مۆدار، مەردەمۆدار.

**پرسە گورگانە:** پرسێکی سەرپێییە لە یەکێکیدا، کە نەتەوێ بەگوێی بکەی و بەلام بۆ گلەیی دووا ڕۆژە.

**پرسە گورگانێ:** بڕوانە: پرسە گورگانە.

**پرسچۆرت** (باک.): سەخت، دژوار. (باک.) ــ ی: سەختی، دژواری.

**پرسراو:** (دەر.) پرسیاو.

**پرسک** (باک.): پڕیشکی ئاووری.

**پرسکار:** پرسیارکەر، پرسەر.

**پرسکەر:** پرسیارکەر، پرسیارکار.

**پرسکردن:** پرسین، پرسکرن.

**پرسیار:** پرسکار، لێپرس، پرسکەر. پرس. ــ کردن: پرسکرن، پرسین.

**پرسیارکار:** پرسکار، لێپرس.

**پرسیارۆک** (باک.): پرسیاران.

**پرسیارۆکی:** ئەو کەسەیە، کە زۆر پرسیار بکات، بە پرسیار.

**پرسیاو:** پرسراو.

**پرسین** (باک.): پرسیارکردن، پرسکرن، لێپرسین، لێپرسینەوە.

**پرسینەوە:** بەسەرکردنەوەی چت بە پرسین ؛ فیسارەکەس لەدۆستی خۆی دەپرسێتەوە.

**پرش:** پڕژ، بلاو.

**پڕشان:** پڕژان.

**پڕشاندن** (هەو.): پڕژاندن.

**پرشە:** بریسکانەوەی شتی بە شەرق وەک ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ وگەلێ چتی تر. پڕشنگ.

**پرشەرش:** پڕشەی یەک لە دووای یەکتری.

**پڕشەنگ:** (موک.، هەورا.) زۆر شۆخ، زۆر شەنگ. چریسکە، (دەر.) پشک، (بابا.) پڕشنگ، پزوسک، پزووسکە، پڕشە. جیلو و تیشکی ڕۆژێیە. پڕیشکی ئاو یا ئاووری.

**پرشکە** (ڕۆژ.): پارچە گۆشتێکە.

**پڕشن:** پڕشنگ.

**پڕشنگ** (بابا.): پرشەنگ، پڕشن. پرشەی مانگ و ئەستێرە و ڕۆژ و ئەو شتانەیە، کە لەبەر هەتاو دەبریسکێتەوە. پڕیشکی ئاووری.

**پرش و بلاو:** پڕژ و بلاو، پشاو، پەڕش و بلاو.

**پرق:** (هەر.): مەڕ، کاوڕ یا بەرخێکە زگ زل و وورگن بێ، (باک.) قاقای پێکەنین.

**پرقین:** لە پریقەی پێکەنینێدان.

**پرقینە:** ڤرقینە، قرخینە.

**پرک:** پردی چکۆڵە. تلّتە، برکە، خلّتە. (بابا.) ئەو خاڵانەیە کە لەسەر گەلاّی گەیشتووی توو تنێ پەیدادەبێ.

**پرکاندن:** ترووکاندنی چاو.

**پرکە** (ڕۆژ.): قاقای پێکەنینێ، بە توندی پێکەنین، پرمەی پێکەنین.

**پرکردن:** تژی کردن، داگرتن، تەپانن، تژەکرن. پترکردن.

**پرکردنەوە:** تژی کردنەوە، داگرتنەوە.

**پرکێش:** زاتدار، بەزات، ئازا، سەرکێش، (هەورا.) تەبا. پر ڕوویی.

**پرکێشان:** ڕووهەڵاوێژتن، زاتکردن، برکردن.

**پرکێشی:** زات، ئازایی، توانایی. — کردن: زاتکردن، بە خۆدا ڕاپەرموونی کردنی کارێک.

**پرگ:** برک، برش، کەڕوو، پشی. (ش.) کرمی ماسییە، گەرا. (هەورا.، بابا.)، کەڕەکیفەی سەر ترش و ئیترە، بەو چتە سپییانە دەڵێن، کە لەسەر ڕووی سرکە و یا چتی دیکە ڕادەوەستی، کەڕووی نان و سرکەو دۆ و ئیتر. پەڵەیەک لە زەوی یا دەغڵ و دان. مێگەلی ئاژاڵ و گەلەی ماڵاتان.

**پرگە:** گەرای کوللە و کرم و ماسی. (ئەردە.) توو، خۆڵێکە، کە بەسەر بەفریدا دەکەن بۆ تاواندنەوەی.

**پرگۆشت:** بریتییە لە گیانداری زۆر قەڵەو.

**پرگەهەڵێنان:** پەیدابوونی کەڕوو لەسەر چتی شل یا تەڕ.

**پرمانن:** پرماندن.

**پرماندن:** پرمەکردنی وولاّخ لەکاتی لەوەڕیدا، باو و بژ بە لووتدا دەرپەڕاندن.

**پرمە:** مرقە، پرکەی پێکەنین. پیرە، فرمە، پژمە، دەنگی لووتی چارەوێ. — ی وولاّخان لەکاتی خوواردنێدا. — ی گریان. — کردن: پرماندن، هەناسەدان بە لووت بە توندی، کە دەنگی لێ بێت.

**پرمەپرم:** پیرەپیر، دەنگی خوواردنی وولاّخانی بەرزەیە. پرم و هۆڕ. — کردن: پرماندن. مرقاندن.

**پرمەی گریان:** پلمە، فرمەی گریان، تەووژمی گریان.

**پرمقی** (باد.): گرژی، چرچی، لۆچی ڕوو.

**پرمێشک:** مرۆی زۆر ژیر.

**پرنە:** (ڕۆژ.) گورج و گۆڵ، چالاک. — کردن: بە گورج و گۆڵی پرپێدا کردن، تێرۆهاتن. (زەن.) جانەوەر.

**پرندە** (جا.): جانەوەر.

**پرنەی** (باک.): هەژار، بەدبەخت.

**پرنەین** (باک.): وێکهاتن، کرووژم هەڵاتن.

**پرنۆ** (ئەردە.): دەلیل، بەڵگە.

**پرنۆڵ:** پارچەیەک کالاّی شڕ، تیتۆڵ.

**پرواندن:** لێکخشاندن و وولێنی کالاّو چتی تەنراو بۆ لێکردنەوەی چتێک، کە پێیەوە نووسابێ. ووردکردن. تێکۆشین، تریت (تلّیت) کردن. وەراندنی گوڵی شینایی و دانەوێڵە.

**پروانن:** پرواندن، وولێنی گوڵی دانەوێڵە و پاک کردنی دانەکانی و لابردنی پووش و پەڵاش.

**پرووش** (باد.): خۆشبەز، خۆشڕۆ. (باد.) — ی: خۆشبەزی، خۆشڕۆیی.

**پروپا:** پلوپا، پاوپل، توانا، توانایی، شیاوی. تەڵووپا، کەن و کۆ، تاوتوو، تاوتووێ، کۆشش، تەلاش.

**پروپاتاڵ:** چتمەکی پڕو پووچی بێ نرخ.

**پروپەشێو:** شووتێنێکە، کە پڕبێ لە کەل و پەلی ناوماڵ بە نارێکی.

**پرو و پووچ:** بێ سوود، ووتەی بێ واتا. هیچ و پووچ، قلی و بلی، زیف، مرۆی جرنافرنا، پڕۆز، تاو، (باک.) چەوور، تورڕەهات، درۆی زلی هەڵبەستراوی دوور لە ڕاستی. کاری — : (باک.) فیلحین.

**پرووپووش:** چرپ و چاڵ، هەژگ و هەژاڵ، پژگاڵ، هەژاڵ، پووش و پەڵاش، پلوو پووش، هەڵاش، پووش و پەڵاخ.

**پر و پۆشتە:** پۆشتە و پەرداخ.

**پروپیت:** چتمەک، چتومەک. وورده کەل و پەلی ژنان. جل و بەرگی کۆن.

**پروپیتاک:** جل و بەرگی کۆن. چتمەک. وورده کەل و پەلی ژنان.

**پروپیتاڵ:** پروپیت.

**پرۆت** (باک.): گۆزەگەر لەکاتی گۆزە دروستکردنێدا.

**پرۆز:** نارێک، بێ جێ، پڕ و پووچ.

**پرووز:** (باک.) بەدخوو، بەد ڕەفتار، بەد ڕەووشت. نارێکی، چەوتی کەناری قاقەز و پارچەی تەنراو، کە هێشتا لێی نەبووبێتەوە؛ — ی کەواکەم دەرکەوتووە واتە قەراخی ئاوەوەی هاتۆتە دەرەوە. ئەنگ و شوورەیی: فیسارەکەس — ی دەرکەوت: واتە ئەنگ و شوورەیی دەرکەوت. بۆکرووز، بۆ پرووز.

**پرووزان:** هەڵپرووزان.

**پرووزاندن:** هەڵپرووزاندن، پردووخانن، هەڵپرووزانن.

**پرووزانن:** پرووزاندن.

**پرۆزە:** سووتان، سۆزیان. (هەورا.) بۆ پرووز، بۆکرووز؛ ئەوا لە تینوان — م لێ دێ: بۆکرووزم لێدێ. کارنامە، بەرنامە، بارنامە. پاتاڵ، پاتار، پاتاغ، پاتاک، بنەوان، بنەچەکە، ڕەگ و ڕیشەی شوورەیی ونرتک.

**پرووزکان:** پچڕان.

**پرووزکاندن:** پچڕاندن.

**پرووزکاو:** پچڕاو.

**پرووزگار** (هەورا.): کز، کەساس.

**پرووزی** (باک.): بەدخوویی.

**پرووزیان** (ئەردە.): سووتان، هەڵپرووزان.

**پرۆژە:** کارنامە، بارنامە، بەرنامە.

**پرووساندن** (باک.): پریشک ئاوێژتن.

**پرووسەل:** گیایەکە.

**پڕووسقان:** پچڕان.

**پڕوسقاندن:** بڕین، هەڵگەڕاندن (شیر).

**پڕووسقانن** (ئەردە.): پچڕاندن.

**پڕووسقاو** (ئەردە.): پچڕاو.

**پڕووسقیان:** پچڕان، هەڵگەڕانی شیر. ڕەنگ سپی هەڵگەڕان لە ترسان.

**پڕووسک:** ئێسک، نێسک و پڕووسک. (ئەردە.) پزیسک، پرشنگ. (ڕۆژ.) پرِیشکی ئاووری.

**پڕووسکان:** پڕووزکان.

**پڕووسکاندن:** پڕووزکاندن.

**پڕووسکاو:** پچڕاو.

**پڕووسکە:** پڕووسک.

**پڕووسی** (باک.): پڕیشکاندن.

**پڕووش** (ئەردە.): پڕووسک، پۆڵوو، پەنگر. وورده تووکی دار و گەڵێ چتی تر، کە هەڵیدابێ.

**پڕووشە:** سەرەتای بەفرانبارینێیە، کە کلوو کلوو لە سەرەخۆ دەباریێ. پڕووش. تووکە، پڕووکە. ــ کردن: بەفر دەستی بە بارینێ کردووە، کلوو کلوو هاتنە خوارێ. (ڕۆژ.) ڕق، قین، پشم و کینی زۆر، بەدەم ڕقەوە جنێودان.

**پڕووشەپڕووش:** تووکەتووک، پڕووک.

**پڕووشەکردن:** وورده وورده بارینی بەفر. کەمکەمە خواردنی منداڵی ساوا و یا نەخۆشێکی کە دەمێ بێ خواردنی نەخواردبێ.

**پڕووکان:** پچەڕان، هەڵپڕووزان.

**پڕووکان:** (دەر.) تڕووکانی چاو. ماندووبوونێکی سەخت. هەڵپڕوان.

**پڕووکاندن:** ماندووکردنێکی سەخت. هەڵپڕوواندن. (دەر.) تڕووکاندنی چاو.

**پڕووکاندن:** پچەڕاندن، هەڵپڕووزاندن.

**پڕووکاندنەوە:** پچەڕاندنەوە، هەڵپڕزوواندنەوە.

**پڕووکانن** (ئەردە.): بڕینی بەندی دڵ، بڕینی ڕیخۆڵە.

**پڕووکاو:** ڕەنگ پڕووکاو، دەق شکاو، بێ دەق، هەژار.

**پڕووکاو:** پچەڕاو.

**پڕووکە** (ئەردە.): پڕووشە، دەنکدەنک و لەسەرەخۆ بەفر بارین، تووکە.

**پڕووکەپڕووک:** پڕووشەپڕووش. (ئەردە.) نووکەنووکی گریان. فینکەفینکی گریانی.

**پڕووگیاک** (ئەردە.): پچڕاو، بڕیاگ، بڕاو.

**پڕووکیان:** پچڕان، بڕان.

**پڕووکیای** (هەورا.): پڕووکان، پڕووکانەوە.

**پڕووکیاو** (ئەردە.): پڕووکاو.

**پڕۆگرام:** (باک.) پڕۆنەڤیس.

**پڕۆم:** (گەر.) لووتکەی چیا. لووتکەی هەرە سەرەوەی چیایان.

**پڕۆمێزوولی** (باک.): لە کەڵکەڵەدابوون. لە خەیاڵدابوون.

**پڕۆناڤ:** ڕاناو، پڕۆنێو، جێناو، جێنێو.

**پڕۆنەڤیس:** پڕۆگرام.

**پڕۆنیۆ:** پڕۆناڤ، ڕاناو.

**پڕۆهندک:** نزیکی، نێزیکی.

**پڕویاگ** (ئەردە.): دڕاو. ووردکراو، تێکوشراو، تریت، تلّیت.

**پڕوویاگە** (ئەردە.): ووردکراو، تێکوشراو، کراوە بە تلّیت، تلّیتە، تریتە.

**پڕهەنگ:** فەرهەنگ.

**پڕی:** تەڕیتی، تڕیتی.

**پڕیاسکە** (کۆ.): پڕێسکە.

**پڕیانکرد گەسەو:** پڕیانکردووە، هانیانداوە، ڕقیان هەڵستاندووە.

**پڕیچی** (باد.): چاوی کزی پیر و پووشاوی.

**پڕی دەڕیێ:** (دەر.) پڕی شەلوارەکەی. (هەورا.) پابەرێ زەردکەرد.

**پڕێزە** (باک.): پەرێز. زەوییەکە دروێنەی لێکرابێ.

**پڕێز** (باک.): پڕسوود. بەرە جووتدار، بەرووبۆدار، ڕەواردار.

**پڕێژمار** (باک.): بێ ئەژمار.

**پڕیس** (باک.): پڕیشکی ئاوورییە.

**پڕیسک:** پڕیشک، پڕووسک. پزیسک.

**پڕێسکە:** (کۆ.) پڕیاسکە. (هەورا.) پیازکە واتا بە قەدەر پیوازێک.

**پڕیسکە** (ئامێد.): نەردیوان.

**پڕیش:** پڕاش، وورد، تیکە.

**پڕێش** (ئەردە.): چتی وورد.

**پڕێش پڕێش:** هەلاهەلا، ووردوخاش.

**پڕیشک:** (باک.) پڕووسک (بۆ ئاوور). پڕشەنگ، (هەورا.) پزووسکی. پرسک (بۆ ئاو)، (باک.) بڕنک. (دەر.) پشکە (تەنها بۆ ئاوە). (باک.) پەشک (بۆ ئاوورییە). (ڕۆژ.) پزیسک. (باک.) پڕچک (پڕیشکی ئاوورییە). (هەورا.) پڕژ. ڕژیی (بۆ ئاوورییە). کیریسک (بۆ ئاوورییە). چەند پارچەیێکی وورده کە لە چتێک بێتەوە. ــ ئاوێژتنی ئاوور: پڕووسی، پڕووساندن، چرێژان. ــ دانی ئاوور: ژەنین.

**پڕیق و هۆڕ:** تریق وهۆڕی پێکەنین، قاقا پێکەنین.

**پڕیق وهووڕ:** پێکەنینی قاقا.

**پڕیکە:** قاقا، ترتوو هۆڕ.

**پڕیکە پڕیک:** قاقا، تریق و هۆڕ.

**پڕیک و هۆڕ** : پڕیق و هووڕ.

**پڕینکان:** بەترسەوە کشانەوە، ترسان. سڵەمینەوە بۆ مرۆڤ.

**پڕینگانەوە:** بەترسەوە کشانەوە دوواوە، گەڕانەوە دوواوە. سڵەمینەوە بۆ مرۆڤ.

**پڕینگاندنەوە:** سڵەماندنەوە بۆ مرۆڤ، ترساندن، بەترسەوە کشاندنەوە دوواوە.

**پز:** (باد.) منداڵێکە لە زگی دایکی دابێ و دووای بوونیشی تا مانگێکی. پس. (بابا.) تۆلە. (باک.) کوڕ، منداڵ. سستی، بێتێنی. بڵند، گەورە. برین، کووان، کولی.

**پزان** (زا.): پزدان.

**پزە** (ڕۆژ.): پزووی دەرپێ. پەسیوی و هەلاّمەتی ئاژالاّن.

**پزپزک** (باک.): فیتەی بلوێرێ.

**پزپزۆک** (باک.): جغارە، جگەرە، سیغار.

**پزدان**: مندالّدان، پزدانک، پسدان. (خۆ.) دەولّیباز. (باک.) پزان. مندالّدانی ئاژالاّن. پرزانک. ــ ی بزنان: کاردانە. پێستێکی تەنکە لە زگی ئاژالان و مانگایاندا بێچووی تێدا بەرهەم دێت.

**پزدانک** (باک.): پزدان، پسدان.

**پزدۆک**: زیادە گۆشتێکە سا بەهەر جێگایەکی ڕوو یا لە شەوە بێت.

**پزرووک** (باک.): خوڕڕەمە بارانە، بارانێکە زۆر و بەرێژەو بێ.

**پزشک**: بڕوانە: پزیشک.

**پزشکی**: بڕوانە: پزیشکی.

**پزگ**: پزووی دەرپێ، پزە. پزوویەکە تووشی ئاژالاّن دەبێ وەکوو هەلاّمەت وایە بۆ ئاژال دەلّێن (پزوو) بۆ ماین و ئەسپ کەمەقاو، بۆ ڕەشە وولاّخ تەبەق، بۆ سەگ سەگە ناز.

**پزمارێ** (هەورا.): مێخەکە.

**پزمام**: پسمام، ئامۆزا.

**پزۆ** (باد.): مرازی بانگکردنە بە تایبەتی بۆکوڕان.

**پزوو**: (دەر.) پزی. پزە. (بابا.) نافەک. (دزە.، ڕەوا.، سوور.) نیفۆ، شووێنێکە لە دەرپێ و پانتۆلّ دۆخینی تێهەلّدەکێشرێ. دەمی ڕەشکەی کاکێشان. (مامە.، بالّە.) ئەو بەفرەیە، کە با پێش دەرک و دیوارانی پێ دەگرێ. هەلاّمەتی مەڕ و بزنان، مرخە، پسکە.

**پزۆر** (زا.): ناوزگ و ڕیخۆلّەی گیانداران.

**پزوور** (باک.): ڕیخۆلّە.

**پزووسک** (ئەردە.): پزیسک، پزوورسک، پرشنگ. ــ ی: (هەورا.) پڕیشک.

**پزووسکە** (ئەردە.): پزوورسک.

**پزێ** (باد.): مرازی بانگ کردنێیە بە تایبەتی بۆ کچان.

**پزی**: (باک.، دەر.) پزووی دەرپێ. (گۆ.، بۆتا.) باخەلّ، باغەلّ. (باک.) مەمک، سینگ.

**پزیسک**: (ڕۆژ.) ڕزیی. پڕیشکی ئاوور و ئیتر. پەزلّووە ئاووورە گچکەکانە لەناو خۆلّەمێشیدا.

**پزیشک**: پزیشک، دۆکتۆری لەشی مرۆڤان.

**پزیشکخانە**: شووێنی پزشک. دەبوستانی پزیشک.

**پزیشکنامە**: پەڕتووکی پزیشکی.

**پزیشکی**: زانیاری پیشەی پزشکانە. زانیارێکە لە بابەت پزیشکێتییەوە. بنەڕەتی ــ، پیشەی ــ: (باک.) بابن.

**پزیشکی ئاژالّ و مالاّتان**: ئەو پزیشکەیە، کە تایبەتمەند بێ بە چارەسەرکردنی ئاژالّ و مالاّتان.

**پزینک**: بلاّمک، بزمەک، بەلاّمک.

**پژ** (بابا.): بژ، پرژۆلّ. بژی گولّە گەنم و جۆ و گولّە پێغەمبەرە و ئیتر. سەر و پۆپەی دار و درەختان. لق و پۆپی داران، پژالّ، پژوو پۆ. (باک.) فراوان. دەنگی پژاندنییە. هەلّمسان. ــ بوون: باکران، باکردن، هەلاّمسان. ــ کرن: باکردن، هەلاّمسان.

**پژا** (باک.): کولاّو، پوخت، پوختە.

**پژاک** (باک.): تنۆک.

**پژالّ** (ئەردە.): بژی سەر لقی دار و درەختان.

**پژان**: (ڕۆژ.) ڕژانی بنی کچان. ڕاسانی خووێنی لووت، دارسان، پەخش و بلاّوبوونەوە. چرژان، پرژان. زمان ــ: زمانکردنەوەی مندالاّن.

**پژاندن**: چرژاندن، پژانن، پرژاندن، ڕژاندن. (باک.) کولاّندن، پوختکردن. لە ناوبردنی کچێنی کچان.

**پژانن**: پژاندن. پێوەرکردن.

**پژاو**: بلاّو، ڕژاو، پرژاو، پەخشکراو.

**پژە**: چەند پڕشەیێک لە ئاو، پرژە. (ئەردە.) پشیلە.

**پژبێن** (ڕۆژ.): پشتێند.

**پژقاندن** (باک.): ئاوڕشتن، ئاو ڕژاندن، ئاو پێداکردن.

**پژک** (باک.): زگچوون، ڕەوانی.

**پژگ**: پشک.

**پژگالّ**: (هەورا.): پووش و پەلاّش، هەژالّ، پرووپووش، هەژگ و هەژالّ، چرپ و چالّی. کار و فەرمان.

**پژلّ**: هەژگ و پژالّ، بژی سەرلکی درەختانە.

**پژلاندن** (باک.): پارچەکردن، لەتوکوتکردن. تۆقین، هەلّتۆقین.

**پژمان** (باک.): پەشیمان. نێوی مرۆیانە: ــ ی بەختیاری.

**پژماندن** (ڕۆژ.): پشماندن، وەپشمین خستن.

**پژمای** (هەورا.): پشمین.

**پژمە**: پشمە. هاتنە دەرەوەی بار تەزوویەکە لە لووتەوە بە تەوورژمێکی را کە دەنگی لێبێت.

**پژمەپژم**: پشمەی یەک لە دووای یەکتر. پشمەپشم.

**پژمل**: (ڕۆژ.) پشتەستۆ، پشتمل، بەوشمل، پاتن، پاتک، ستووکوور.

**پژملە**: شەپەلاّخە، زللەی پژملێیە.

**پژملپان**: پشت مل پان.

**پژمێن**: برنووتی.

**پژمین** (هەورا.، ڕۆژ.): پشمین، پژمە.

**پژنچە** (ئەردە.): فلّچە، شانەی جۆلاّیە.

**پژوو** (باد.): یالّی وولاّخ.

**پژووپۆ** (ئەردە.): لق و پۆپی درەخت کە بڕابێ.

**پژوپوولّ**: پەرژوبلاّو.

**پژوون** (باک.): گزرەی گیا.

**پژوێن**: پشتێند.

**پژوین**: پشتێند.

**پژوێنە**: پشتێنە.

**پڕی** (هەورا.): لق و پۆپی داران،، هەژگ، هەژاڵ. (باد.) یاڵی ووڵاخ.

**پڕیاگ** (ئەردە.): پڕاو، پڕژاو.

**پڕیان**: پڕان، پڕژان.

**پڕیاو**: بروانە: پڕیاک.

**پڕێن**: پڕێنەر. ئاو ـــ: ئاوپڕژێن. تۆو ـــ: تۆو چێن.

**پڕین**: (باک.) کوڵان، پوختبوون. (بابا.) دارِسانی خوێنی لووت. (ئەردە.) پرژان، رشان.

**پڕێنەر**: پڕێن.

**پس**: (باد.، باک.) پز، تۆل، بەر. منداڵێکە لەناو زگی دایکیدابێ و کە هاتیشە دەر تا مانگێکی هەر پسی پێدەڵێن. کوڕ. خت، ختە: پشیلەی پێ دەردەکرێ. (باک.) کوڕ: پسمام، ئامۆزا، کە کوڕ بێ. پسک، فسەزمان، کەسێکە بە سەری زمان بدوێ.

**پسا**: (دەر.) پسیا. بۆ ڕابردووە. سەرچاوەکەی (پسان)ە.

**پسات**: گێتی، دونیا، ڕووی سەر زەوی، جیهان.

**پسان**: پچڕان، قورمسان، بڕیان، (هەورا.) پسیاوی، بۆ ووڵاخی بەرزەش بەکاردەبرێ، کە زۆری غار دابێ. (دەر.) پسیان. پچەڕان، پچکان. پرووکانی گیاندار بەهۆی زۆر پێگەیشتنێکەوە. کراسی ژنانە، کراسی فەرەنگی.

**پسانەوە**: پچڕانەوە، تەزبیحەکەم پسایەوە، لەشکرەکە ئەوەندە زۆر بوو هەر نەپسایەوە.

**پساندن**: پچەڕاندن، پچکاندن، قرتاندن، قورمساندن، پرووکاندن.

**پساو**: پچکاو، پچڕاو.

**پسەپس**: سرتەسرت، پرتەپرت.

**پسپان** (باک.): پینە ـــ کردن: پینەکردن. پارچە.

**پسپس**: پرزۆڵە پرزۆڵە، پچڕپچڕ، پسپسۆک. پشپش (پشیلەی پێ بانگ دەکرێ).

**پسپساندن** (باک.): سرتەسرتکردن، بەهێواشی بە گوێ دادان، بە چرپە ئاخۆتن.

**پسپسە** (باد.): پەسیوی ئاژاڵانە.

**پسپسەکەڵە** (ئەردە.): جاڵجاڵۆکە.

**پسپستلی** (هەورا.): جاڵجاڵۆکە.

**پسپسۆک**: زەرزەنگ، شاران(تەسبیح). پسپس، پارچەپارچە، پچڕپچڕ.

**پسپسیک** (باد.): پشیلە.

**پسپۆڕ**: ڕەچەڵەکناس، کاردار، زۆرزان، زۆرازانا. ئاژاڵداریکە، کە لە بەسەرکردنەوە و ناسینەوەی ئاژاڵاندا زۆر لێهاتوو و شارەزا بێ بە پایەیێکی وا مەرێکی گوم بووبێ کە چەند زگ وزای کردبێ بەهۆی دروشم و نیشانەکانییەوە بێچووەکەی دەناسێتەوە.

**پسپۆڕی**: ڕەگەزناسی، ڕەچەڵەکناسی. ـــ گیایان: گیاناسی. ـــ دەرمانان: دەرمان ناسی. ـــ نەخۆشیان: نەخۆشی ناسی. ـــ مەڕان: مەڕناسی.

**پسپۆڕێتی**: ڕەگەز ناسێتی، ڕەچەڵەکناسێتی.

**پسپۆڕی سوپایی**: ڕەگەزناسی سوپایی. سوپاناسی.

**پسپۆڕێتی سوپایی**: سوپاناسێتی.

**پسپۆڕی وەڕامی**: وەرامناسی. ئابووری ناس.

**پسپێری** (باک.): پێشبینی.

**پست** (باک.): پشت، پشتە، ختە، ختتە. دەنگێکە پشیلەی پێ دەردەکرێت.

**پستەپست**: سرتەسرت. (باک.) ویزەی گوللەیە، ترپەی گوللەیە.

**پستان**: فستان.

**پستە**: پوستە، جوورە بادامێکی ناسکە.

**پستەپست** (خۆ.): پرتەپرت، سرتەسرت. (دزە.) ترمەترم. (هەورا.) پسەپس.

**پستەق** (باک.): مێووژی خراپ.

**پسترک** (باد.): پەیژە.

**پستۆز** (باک.): ئێخە.

**پستوو** (باد.): ئێخە، یەخە.

**پسخاڵ** (باک.): خاڵۆزا، لالۆزا، کە کوڕ بێ.

**پسدار**: پزدار، تۆڵدار، ئاووس.

**پسدان**: پزدان، پزدانک. دەفر.

**پسک**: فسەزمان، لاڵەپتە، لاڵەپەتە، (دەر.) فس زوبان. (ڕۆژ.، باک.) پشیلە، پسنگ. ـــ بەژی: پسکابەری: پشیلەی چۆڵی. بسک.

**پسکە**: هەڵامەتی ئاژاڵانە. مرخە، پزوو، دەرفزە. وورده ڕۆیشتنی ڕاوچییە بۆلای نێچیری. باڵ لێکدانی جوجیلانە لە بەردەمی دایکیان و باوکیان تا دانیان بداتێ. گیایەکی گوڵ پان و زەردە بەژنێک بڵند دەبێ و لاسکی پڕ بە چەنگی ئەستوور دەبێ گەڵایەکانی خوارەوەی بەقەدەر نی سڵقییە و هی لای سەری بەقەد گەڵای توویە، دووای ووشک بوونی چەند پارچەیێکی لاسکەکەی، کە هولۆک دەکەن و لە ملی ماڵاتی مرخداری دەکەن چاکی دەکاتەوە. باڵ کردنەوەی بێچووە باڵندانە لە کاتی ویستنی فڕین و یا دیتنی دایکە و باوکەیان و یا لە چاوەڕێییدان.

**پسکەپسک**: پسکەی یەک لە دووای یەکتری، ماتەمات.

**پسکۆڵە** (باک.): بسکۆڵە، جوورە خشڵێکە.

**پسکی**: فسەزمانی.

**پسکیان** (ئەردە.): پسکە.

**پسڵ**: لووشەیێکە لەناو چێشتی دۆکوڵێوی دەکرێ، کە گیایەکی کوردستانییە.

**پسمار** (هەورا.): بزمار.

**پسمارێ** (هەورا.): مێخەکە.

**پسمام** (باک.): ئامۆزا، کوڕی مام، پزمام.

**پسمیران**: خانەدان، میرزادە.

**پسنچک** (موک.): قولینچکێکی زەوییە. گیایەکیشە یەک تیش هەڵدەچێ و قایمە دەکرێتە باقەبێن و بۆ جووانی شەپکەشی لێ دروستدەکرێ.

**پسنگ** (باک.): پشیلە.

**پسوولە**: ـــ ی تێپەڕینێ: پەساپۆرت. (باک.) پەستەوان.

**پسووڵمان**: مسوڵمان. ـــ ی: مسوڵمانی.

**پسێ** (هەورا.): پزوو.

**پسیان** (دەر.): پسان، (ئەردە.) داپسیان، شل بوونەوە، سستی. خۆنزم کردنی باڵندەی مێ بۆ نێرەکەی.

**پسیاندن** (دەر.): پساندن.

**پسیای** (هەورا.): پسان.

**پسیزک**: پزیسک.

**پسیک** (باک.): پشیلە، کتک.

**پسێنراو**: پچکرێنراو، (باک.) پچکانراو.

**پش** (باد.): زەق. ـــ کرن: چاو زەقکردنەوە. (هەر.) بەفری کولوو گەورە. بەهرە، بەش، جوون. ـــ کردن: بەشکردن. ژەنگ، نازارێکە تووشی ڕەز و باخان دێت، دەڵێن ئەو ساڵ ترێمان نەبوو چونکوو ـــ ی لێدابوو. (باک.) جەرگ، سیپەلاک. ـــ ا ڕەش: جەرگ. ـــ ا سپی: سیپەلاک. ووتەیێکە پشیلەی پێ بانگ دەکرێ و پشیلەشی پێ دەردەکرێ. (باک.) ئاردی زۆر وورد.

**پشارەش** (باک.): جەرگ.

**پشاسپی** (باک.): سیپەلاک.

**پشافتن** (باک.): هەڵپشاوتن، تاواندنەوە، ووردکردن.

**پشافیک** (باک.): بنیسکی سابوونی.

**پشام** (ئەردە.): ئاوروسان، هەوکردن.

**پشان**: پەرش و بڵاوبوون.

**پشاندن**: پەرش و بڵاوکردنەوەی خۆڵ یا تۆو و نیتر. پرژوبڵاو، پەخش و بڵاوکردنەوە.

**پشاو**: پەرش و بڵاو، پرش و بڵاو.

**پشاوتن**: (دەر.) هەڵپشاوتن، هەڵپشافتن.

**پشە**: پشیلە.

پشە

**پشەپش**: دەنگێکە پشیلەی پێ بانگ دەکرێ.

**پشبەن**: پشبەند.

**پشبەند** (فە.): پشتێند.

**پشبێن**: پشتێن.

**پشپرک** (باک.): مرازێکە لە کەرستەی جووتی.

**پشپش**: دەنگێکە پشیلەی پێ بانگ دەکرێ.

**پشپشۆکە**: گیایەکە پڕێژی زۆرە وەک کلکی پشیلەیە.

**پشپۆ**: مرازێکی تەونییە.

**پشپێند**: پشتێند.

**پشت**: ڕەچەڵەک، بەرەباب، بنەچەکە، باب و باپیر و تیرە. ـــ پێبەستن: بە هیوا و ئومێدبوون، تێڕادیتن، تێڕابینین. لای پشتەوەی لەش لە شانەکانەوە تا سەر سمتەکانی پشتی پێدەڵێن (هەورا.) مازی. ژنکا پشت لە ئەردی: ژنی مارەکراو. ـــ دان: پشت وەرگێڕان. هەڵاتن. ـــ شکێناندن: بەسەردا چیرە بوون. پاش، دووایە، لە پاشان، پشتەوە. دـــ ڕە: دیشت قە: لە پاشان. یاریکار، یارمەتیدەر، پشتیوان، پەنا. ڕووکارە قۆقزەکەی جگ (میچ) یە. ووشەیەکە پشیلەی پێ دەردەکرێ، ختتە، پشتەپشت، فس.

**پشتاو** (کۆ.): دیمەکار، تەنها بۆ زەوی دەغڵ و دان دەبێ. (ئەردە.) دەمانچە، دەوانچە.

**پشتا و پشت**: پاشەوپاش، پشتەودووا. ـــ گەڕانەوە: پاشەوپاش گەڕانەوە.

**پشتەسپ** (فە.): جێنشین، میرزادە.

**پشت ئەخت** (مەلیش.، شو.): مارەیی.

**پشت ئەغد** (مەلیش.، شو.): مارەیی.

**پشت ئەستوور**: پشت قایم، خاوەند کەس و کار و هێز، (باک.) قیمە. دڵنیا.

**پشت ئەستووری**: پشت قایمی، قیم.

**پشتە**: پشتی جگی جگێنییە. پشت، کەس و کار، تیرە و هۆز. ختە، ختتەخت، دەنگێکە پشیلەی پێدەردەکرێ. (هەورا.) شەپکە. (هەو.، کۆ.) کەنارە بڵندەکانی دێراو و دووکانی بێستانانە، هەوراز، زەوی کەمێک بڵند. پشتک. لا لووسەکەی جگی، تەف، تەففە. (هەورا.) کۆڵ، ئەو بڕە چتەیە، کە بە کۆڵ هەڵبگیرێ.

**پشتەپا** (ئەردە.): پشتی پێ.

**پشتەپشت**: ختتەخت.

**پشتەپێ**: شەق.

**پشتەرۆژ** (هەو.): مۆڵگە.

**پشتەرێژ** (ئەردە.): پشترێژ، پشتەرێش.

**پشتەرێشە** (ئەردە.): برینداری پشتی وولاخ بەهۆی بارەوە یا سوارییەوە.

**پشتەسەر**: جوورە خشڵێکی پڕپەرەدارە لە زێڕ یا لە زێوی ژنان لە پشتی سەریان دەدەن. پاشملە.

**پشتەسەرە** (هەورا.): پاشەسەرە. جوورە خشڵێکە.

**پشتەستۆ**: پژمل.

**پشتەستوور**: بڕوانە: پشت ئەستوور.

**پشتەڤان** (باد.): پشتیوان.

**پشتەک**: (کە.) ڕانکە، تووکە هێندەی گوڵێنکێکی بە سەرپشتی ئاژاڵانەوە. (فە.) بەو کەسە دەڵێن، کە لەپشتەوەی سوارێکی سوار بێ، بەڵام فەیلییان بەو کەسەی کە لە پێشەوە سوواردەبێ (وەرەک) ی پێدەڵێن. پشتیوانێکە بدرێتە بەر چتێک.

**پشتەمازە**: گۆشتێکە بەسەر بڕبڕەی پشتەوە.

**پشتەماڵ**: پەشتەماڵ، خاوڵی.

**پشتەمەلە**: جوورە مەلەیێکە لە سەر پشت دەکرێ.

**پشتەملە**: پشتەملێ.

**پشتەملێ**: بە زۆر کار بە یەکێک کردن. (ئەردە.) شەپەلاغەی پژملییە. پاشملە.

**پشتەمێر**: پشتیوان.

**پشتەوە**: (شوا.) دیاوە. (باک.) پار. دوواوە، پاش، پشت. کووین، نافس. لە ـــ: (باک.) ژپار ڕا.

**پشتەوەشکێن**: دیوارێکە بە پشتەوەدا شکابێتەوە.

**پشتەودووا**: پشتاوپشت.

**پشتەوسوور**: پشتەستوور، پشت گەرم.

**پشتەوکەفتن:** خۆ بە دوواداخستن.

**پشتەیوان:** پشت هەیوان.

**پشتبافی** (باک.): هەتیوی باوکی.

**پشتبەر** (باک.): چکۆلەتر، مەبەست لە تەمەنە.

**پشت بەسێڵ:** جوورە کولێرەیەکە، کە لەسەر ساجی و لەسەر پۆلوان دانرابێ و بە هێلکە و چەوری دروستکرابێ.

**پشت بەهنی** (باک.): پانییە.

**پشت پشتانێ** (هەو.): گەمەیەکی کوڕ و کچانە.

**پشت پێن** (باک.): پشتپێندی خوری.

**پشت چاڤ** (باک.): پێڵوو، پەلکی چاو.

**پشتخەنجەر:** خەنجەری چکۆلەیە لە پشتەوە هەڵدەگیرێ.

**پشتخووار** (باک.): کوور، چەماوەرە.

**پشتخورێن** (ئەردە.): چیوپشت، ڕەنکی وولاخان.

**پشتدار:** چتی قایم و داڕێژراو: ئەو کەرە پشتدارە واتە قایمە. تەڵەو، مایەدار، ڕەنگدار، پڕرەنگ. کەسدار، خاوەندپشت وپەنا، پشتیواندار، باواندار، مەغزەدار. ـــ ی: کەسداری، پشتیوانداری، باوانداری.

**پشتدان:** شکان، شکست خواردن، ڕوو لە هەڵاتن کردن. خۆ پانکردنەوە و ڕاوەستانی مێینە بۆ نێرەکەی.

**پشتدانەوە:** پاڵدانەوە، دڵنیابوون. هەڵدانەوەی ئاگری ناو تەندووری پاش دامرکانی تا گەرمایی بداتەوە.

**پشتدەر** (باد.): کە بووک بگوێزنەوە دەرکەی ناکەنەوە تا پارەیەک نەدرێ بەو خزم یا کارەکەر و نۆکەرانەی کە پێش دەرگایان گرتووە.

**پشتڕاست** (باک.): دڵنیا. ـــ ی: دڵنیایی.

**پشتڕێژ:** گیانداری ناوکە ڕێژ. بڕینی پشتی یەکسم. پشتڕێش. ـــ ی: پشتڕێشی.

**پشت ڕێش:** پشت بریندار. ـــ ە: پشت برینداری.

**پشت زین** (باک.): پاش زین.

**پشت سارد:** هەناسە سارد، هیوا بڕاو، ناهومێد، بێهێقی. ـــ بوونەوە: هیوابڕین. ـــ کردنەوە: ناهومێدکردن. ـــ ی: هەناسە ساردی، ناهومێدی.

**پشت سەر:** پشتەوەی سەر، پشتمل. پاشملە.

**پشت ستانگ** (باک.): لە سەرپشت نووستن.

**پشت شکان:** بەلای مەزن.

**پشت شکاندن:** پشت شێکناندن، بەسەردا زاڵ بوون، دەسەڵات بەسەردا پەیداکردن.

**پشت شیف** (باک.): نانی دووای نیوەڕۆیان.

**پشت قایم:** پشت ئەستوور. ـــ ی: پشت ئەستووری.

**پشتقۆڤ** (باک.): کوور، چەماوەرە.

**پشتک** (باد.): بڵندایی دەراوان. پشتە.

**پشتکردنەوە:** بەجێهێشتن، ڕۆیشتن، هەڵاتن، شکان، ڕەوین. دڵنیابوون.

**پشتکوڵ:** پشتەک، دارێکە شەوانە وەبەر دەرگادەدرێ بۆ ئەوەی پتر قایم بێ.

**پشتکووڵ** (ئەردە.): پشکوڵ.

**پشتکوول** (ژە.): پشکەڵ.

**پشتکۆڵە:** گوڵتە، پاڵەوانە.

**پشتکۆم:** کۆم، قوز.

**پشتکێ** (باک.): لەسەرپشت درێژبوو.

**پشتگرتن:** لاگرتن، پاڵشتدان، جەختکردن. ڕێگالێ بڕینەوە، ئەواوپەناو پەسیو لێ بڕینەوە. (ئەردە.) دووشتەکی، سووارێکە یەکێکی تریش لەپشت خۆیەوە سووارکات.

**پشتگوێ:** پشتگوێچکە.

**پشتگوێچکە:** پشتگووێ.

**پشتگوێچکەخستن:** پشتگوێخستن.

**پشتگوێخستن:** لەبیرخۆبردنەوەی کار و فەرمانێکی و نەکردنی.

**پشتگوێ کردن:** هەڵپاچینی ووردەتووکی بن پرچی ژنانە بەمقەست.

**پشتگیر:** لاگر. ـــ ی: لاگیری.

**پشتگین** (ئەردە.): دووامین، هی هەرەدووایی.

**پشت لێدان:** گەمەیەکە چەند کەسێک بەکووڕی لەدووای یەکتری دادەنیشن و بەرووداو بەسەر یەکتریدا دەچن بەلێدانی لەپشتی ئەویتر.

**پشت لێدانەوە:** دڵنیابوون، حەسانەوە نیگەرانی نەمان لەبابەت پێکهاتن یاپێک نەهاتنی کارێکەوە.

**پشت لێ کردنەوە:** پشت لێدانەوە.

**پشتمز** (باک.): پشتمازە، بڕبڕەی پشت.

**پشتمزە:** پشتە مازە، بڕبڕەی پشتی.

**پشتمسی:** دەدانەمشکە.

**پشتمسیلکە:** دەدانە مشکە.

**پشتماکی** (باک.): هەتیوی دایکی.

**پشتماڵە:** پاشماڵە. دەراوسێیەکیشە، کە ماڵی لەپشت ماڵتانەوە بێ.

**پشتمل:** پژمل، پشتی مل، (ڕۆژ.) بەوشمل.

**پشتملە:** پاشملە.

**پشت ملهان:** پژملپان.

**پشت مێر:** کێشکچی پشتەوە. پشتیوان و یارمەتیدەر.

**پشت مێرد** (ڕۆژ.): پشتیوان.

**پشتنەخری** (باک.): پاشبەرە (منداڵ).

**پشتۆ** (باک.): شەش ئاگر، دەمانچە.

**پشت و پەنا:** لەمپەر، پشتمێرد، پشت، پشتیوان، کۆمەگ، پەنا.

**پشتووری** (ئەردە.): پشت ئەستووری، پشتیوانی، کۆمەگی.

**پشتۆکە** (ڕەوا.، خۆ.): پشتی کورسی و قەنەفەیە، کە پاڵییێوە دەدرێت. ئەو دارانەن، کە لە پشت دوو یا چەند تەختەیێکی دەدرێن بۆ قایمی وەکوو هی دەرگە.

**پشتووێن:** پشتێند.

**پشتهەڤ:** پێکەوە، بەیەکەوە، بەشداری.

**پشتهەڵکردن:** مەبەس لە پشت تێکردن و زیزبوونە لە یەکێکی، ڕوولێ وەرگێڕان.

**پشتهەیوان:** ژوورێکە کەوتبێتە پشتی هەیوانەوە.

**پشتی** (هەو.، سوور.، باک.): کۆڵ (نی بە پشتدادانێ)، چتێکە بە کۆڵ هەڵبگیرێ. ـــ کێش: کۆڵکێش، (دەر.) تێلەکەکێش. (باک.) لەپاش، لەدووای. ـــ نیڤرۆ: پاشنیوەڕۆیە، پاشنووێژ. سەنیرێکی درێژوکەی تەنکە پاڵی پێوەدەدرێ. پاشەوانەی هەنگ. (ئەردە.) سەنیر، سەرین، هەرچتێکی وە بەرپشت بدرێ، کۆمەگ، پشتیوان. خەڵفی مێشەنگوورین.

**پشتێر:** پشتیر.

**پشتیر** (جا.، بابا.، ڕۆژ.): تەویلەی ڕەشەوولاخان، هۆڵ، هۆزی مەڕ و بزنانە. گەنجینەی پشت کەلەگی.

**پشتی سەر** (لو.): پاشملە.

**پشتی کێش** (باک.): کۆڵکێش.

**پشتێن** (فە.): پشتێند، چتێکە لەپشت دەبەسترێ، پژوێن.

**پشتێنە:** تەوقێکی ئاسنە ناوەکەی بە شوولێ بی یا شوولکی ژاڵە پڕەکرێتەوە بۆ کرەی چەڵتووک. دارێکە بەناو بەرزەگەوەدا ڕەتدەکرێ تا نەجوولێ. چتێکە بەر بەستی فیچقەی ئاوێتی ئاشی پێ دەکرێ. پشتێندێکە بەسترابێتە ناوقەدی هێندێ چت بۆ قایمی. تەوق و چەرمێکە دەخرێتە نێی ئاش. پشبێن.

**پشتێند:** پشپێند، بشبێند، ناڤکێل، (لو.) قۆلان، کەمەر، پشتین، (باک.) پشتێن، بیبن، بەنک، پێش بین، پشتک، کەمبەر، هەفتاک، ترمە، (هەورا.) بیبین. (ڕەوا.) کەمەربەست، شۆتک لە ناوریشمی وەکوو قایش وایە. (هەو.) بەندۆک، بەنێکە لە پشت دەبەسترێ. (باک.) تاقدەنگ، شینک. تەگبەند، هەمیان. پشتێندێکی باریکە لە لیرە یا لە لوولوو دروستدەکرێت.

**پشتێندە:** ـــ ی پردان: کەمەرە، کەمەر.

**پشتیوان:** لەمپەر، چاوسوور، گومەگ، یارمەتیدەر. (باد.، باک.) پشتەڤان، چاڤسۆر، چاڤشار. دەرقیل، یارمەتیدەر. هەڤگەل. ـــ پێ ئەستوور. ـــ پێ بەستراو. ـــ پێ قایم. بە ـــ: بەپاڵ، کەسدار، لەمپەردار، پشتیواندار. بێ ـــ: بێ کەس، بێچارە، بێ پاڵ. (باد.) کولهەڵگر. دارێکە لە پشت دەرگاوە دەچەقێنرێ تا بخرێتە بەر پشکۆڵ بۆ قایمی، دارێکە لەباری پانی بەپشتی تای دەرگا و دەراپەدا دەکوترێ، پشتکول، تنک.

**پشتیواندار:** بەپشتیوان، بەپاڵ، کەسدار، لەمپەر. ـــ ی: کەسداری، لەمپەرداری.

**پشتیوانی:** یارمەتی، هەڤگەلی، چاڤسۆری. خاوەنداری. ـــ کردن: یارمەتیدان و خاوەنداریکردن.

**پشخووان** (زرا.): تەبەک.

**پشدان:** پشوودان، هەناسەدان.

**پشرۆوون** (باد.): چێشتی پیرخەنیلە.

**پشقەڵ:** پشقل، پشکەڵ.

**پشقڵ:** پشکەڵ.

**پشک:** (ڕۆژ.) دەو، چەشنە. ـــ ئاوێژتن: دەوکرن، چەشنە ئاوێژتن، پارەوپارتێن. (باک.) بەش، پش. ـــ کرن: بەشکردن. پل. ـــ ە گۆشتێک، پلە گۆشتێک. (دەر.) پریشکی ئاو، بارانە، بەفر یا ئاوور. (ڕەوا.) دانەکانی کیسەڵەیە دەچنە نێو لەڵەکانی گۆڵەی دەرکەوە. (هەورا.) مەشکە یا کوندە و ئیتر کە کونبێ چیلکە یا بەردێکی لەنێو دەنێن و دەیبەستن بە چیلکەکە یا بە بەردەکە دەڵێن پشک. (باد.) گۆپکەی درەختانە. بەش.

**پشکافتن:** هەڵوەشان، هەڵوەشاندن، هەڵدڕان.

**پشکامۆک** (باک.): گۆرانییەکی کوردییە.

**پشکاندن** (باک.): پشمین، پشکین.

**پشکاوتن:** هەڵپشکاوتن، هەڵوەشاندنی دروومان و چتی چنراو. بە بلاوکردنەوە و لێک جوویکردنەوەی خوری و موو و لۆکەش دەڵێن. وورشکاندنەوە.

**پشکەگیر** (باک.): لاگیر، لایەنگیر. ـــ ی: لاگیری، لایەنگیری.

**پشکەڵ:** قشپل، پشقەڵ، کشپەڵ، پشکڵ، پشقڵ، بوشکول، (باک.) کوشپل، (یەز.) بشکوول، پیسایی ئاژاڵ و کەروێشک و ئاسک و ئاژالانی کێوییە، کە خڕ و ڕەشە.

**پشکخستن:** دانانی چەند پشکێک لەلایەن یەکێکی نەشارەزاوە لەسەر چەند بەشێک لە چتێک، کە بە هاوکاری کرابێ.

**پشکاڵ** (باک.): گۆنەر، کەژ.

**پشکفتن:** پشکووتن.

**پشکفین** (باک.): هەلچڕان، هەڵوەشانی دروومان.

**پشکناندن** (باک.): پشکنین.

**پشکل:** پشقل.

**پشکڵ:** پشکەڵ.

**پشکنەر:** پشکێنەر، پشکنێر.

**پشکنران:** (باک.) پشکڤین. واق وووڕمان.

**پشکنێر:** پشکنەر، پشکێنەر.

**پشکنین:** گەڕان، (باک.) پشکڤاندن. بە سەرکردنەوە، کۆڵینەوە، منەکردن، دۆزین. پشکناندن، پشکووناندن.

**پشکنینەوە:** پشکووینەوە، هەڵوەشاندنەوە.

**پشکۆ:** (ڕەوا.، هەو.) گۆپکەی دارانە، کە تازە دێ بپشکووێ. گوڵی دار و درەختانە. (بابا.) پۆلوو، پەنگر. (دەر.، هەورا.) تەشق، پشکووێ.

**پشکۆدان:** مەقەڵی، مەنقەڵی.

**پشکووان:** پشکووتن.

**پشکووانن:** خەنیکردن، گەش و شادکردنەوە. خەرۆکردن. ـــ ی خونچە.

**پشکووتن:** پشکووان، کرانەوە، ڤەبوون، پوشکووتن، دەم دانەوەی خونچەی گوڵ و گۆپکەی داران. (دەر.) پشکفتن. خیف بوون. ووردبوونی بەردی قسڵ دوای ئاو پێداکردنی. هەڵتۆقینی گەفەشامی لەسەر سێڵ. خونچە ـــ: خوونچە بوونە گوڵ و دەمکردنەوە. ڕوو ـــ: شاد و کەیفخۆشبوون. نان ـــ: نان وەکوو گوڵ گوڵگوڵ برژا. کەیفخۆش و شادبوون، دڵخۆش بوون، خەنی و خەرۆ بوون.

**پشکووتوو:** خونچەی کراوەوە، پشکفتوو. خەنی، شاد، خەرۆ، دڵخۆش، گەش.

**پشکووژ** (باد.): خونچە.

پشکووتوو

**پشکووژا مەمکا** (ئاک.): گۆی مەمکی.

**پشکۆژە**: (ڕەوا.) پشکۆ. (شن.) پند. (کۆ.) چرۆ.

**پشکۆڤ** (باک.): گوڵی نەپشکووتوو یا تازە پشکووتوو.

**پشکۆک**: (هەورا.) دوگمە، کاناڵێ.

**پشکۆڵ** (فە.): پشکەڵ.

**پشکۆڵ** (هەورا.): دار وەپشت دەرکەدان. ئەشکیل. پاڵی پەست.

**پشکول** (باک.): بشکول، قـوڕ، قـوڕاوی. خۆدزینـەوە، پاشەکشـێ، پێلزکێ. (ئەردە.) مرۆی تێکسرماو و قەڵەو، قۆڵ، قوتوقۆڵ.

**پشکووڵ** (باک.): پشکۆڵ، پشکەڵ، پشقڵ.

**پشکوناندن**: پشکنین.

**پشکوناندنەوە**: پشکنین، دۆزین.

**پشکوونن**: پشکووتن و دەم دانەوەی خونچە گوڵ و گوڵی گەنم و جۆ.

**پشکوونینەوە** (ڕەوا.): پشـکنینەوەی خـوری و لۆکـە و هەڵوەشـاندنەوەو شیکردنەوەی. دۆزیـن. پـەڕەوور خـۆی دەپشـکونێتەوە: بـاڵندە خـۆی دەدۆزێ.

**پشکوێ** (دەر.): تەشق. پۆلوو.

**پشک هاوێژتن**: دەو، دەوکردن.

**پشکی**: تۆزقاڵێ.

**پشکیل** (ئەردە.): پشکیلان، ئەنگوستیلەی بێ نقێمە کە یاری پێدەکرێ.

**پشکیلان**: گەمەی گۆرەوی بازی، تاقمانەجووت، کاڵەمستێ. کاڵەمشـتێ گەمەییێکە بە هەردووک دەستان دەکرێ.

**پشکین**: پشمین.

**پشم**: ڕق، قین، کووڤان، کۆڤان، پرووشە. بە ـــ : ڕقدار، قیندار.

**پشماندن**: پژماندن، ڕق هەڵستان، ڕک گرتن. وەپشمین هێنـان: پژمـاندن، بێهنژاندن.

**پشمە**: بێهنشـک، دەنگـی پشـمین، پـیرکژن. ـــ لێوەهـاتن، پـیرکژن لێوەهاتن.

**پشمین**: (هەو.) پێکژین. (کۆ.، ڕەوا.) پـیرکژین. پژمـین، هەپشـکرن. (باک.) بێهنژین، پشکین. پشکان. یەکجار ـــ : دەڵێن دەبـێ ڕاوەسـتێ و دەست ڕاگرێ. دووجار ـــ : دەڵێن جەختە واتا چاکی هێنا.

**پشۆ** (باک.): پشیلە.

**پشـوو**: (دەر.) هەناسـە، بێـن، بەهـن، پشـی. ـــ بـڕان: خەفـەبوون، خامۆشبوون. ـــ بڕین: خەفەکردن، خامۆشکردن. ئارامی، سانەوە. ـــ دان: ئارام بوون، سانەوە، تبتین. هەناسەدان، تەواسان. ـــ درێژ: بڕوانـە: پشـوو درێژ. ـــ خواردنـەوە: تبتـین، تەواسـان، ئـارام گرتـن، ددان بـە جـەرگی خۆدانان. (ڕەوا.) کەڕووی ئانی، پشی، برش.

**پشـوودار**: پشـوودرێژ، بـاڵدرێژ، بەپشـوو. ـــ ی: پشـوودرێژی، بـاڵدرێژی، بارقۆڵی.

**پشوودان**: حەسانەوە.

**پشوو درێـژ**: دڵفرە، مـەند، خووێنسـارد، بەپشـوو، لەسـەرەخۆ، دلدرێـژ، (خۆ.) بەرگەدار، بەرگەگر، بـارقۆل، بـاڵدرێژ. ـــ ی: وەقـرە، مـەهوار، خووێنساردی.

**پشووسووار**: هەناسە سووار. ـــ ی: هەناسە سوواری.

**پشووک** (باک.): پشنگ.

**پشووگرتن**: پشوودان.

**پشی** (لو.): پشیلە، بۆ دەرکردنی پشیلەش بەکاردەبرێ. (لو.) کولیچـەی بە ڕۆن. (ڕەوا.) پشوو، هەناسە. (خۆ.) ژەنگ. ئازارێکە لـە ڕەز و باخـان دەدات.

**پشیان** (ئەردە.): پژانی ئاو، دەڵاندنی ئاو.

**پشێلیشێ**: پش پش: ووشـەیێکە پشیلەی پـێ بـانگ دەکـرێ. گەمـەیـەکی منداڵانەیە.

**پشیک** (لو.): پشیلە.

**پشیلە**: (هەو.) کتـک. (هەورا.) کتە، کتتـە. (لـو.) پشـی. (بـاک.) پسـک، پسـنگ، پشۆ، دهلک. پشـە. لـە موکریـانێدا بـە پشـیلەی نـێرە دەڵێن گوریە.

**پشیلە سوورە**: گەمەیەکە، یەکێک تێدەکەوێ ئەوانی تر دەست بە یەکتری دەگرن و ئەوەی دەگرنـە نـاو خۆیـان ئـەویش تەقەلا دەدا کە بەناو لنگیـاندا دەرچێ ئەوانیش نایەڵن و دەڵێن: پشیلە سوورە کووێڕا چوو عـەرزی دڕی پێیداچوو، بەڵام بەناو لنگی هەرکامێکیاندا دەرچێ ئەو تێدەکەوێ.

**پشیلە شۆر**: خۆ خاوێن نەشوشتن، دەڵێن: ئەمڕۆ لـە گەرماو لـەبەر ساردیی ئاوەکە خۆم ـــ کرد.

**پشێو**: شپرزە، ناتارام، پەشێو، سەخڵەت، شپرێو، نیگەران. ـــ ی: تـاژاوە، ئاژاوڵە، ئازەڵ، ناتـارامی، بـێ ئـارامی، خرسجر، شکووڤی، شـێواوی، هـەرا، نیگـەرانی، شـۆرش، سـەخڵەتی، ڕەهـتی، خورپـە، ئاشـووب، تێکچوونی ئارامی و ئاسایش.

**پشێوەتی**: شپرزەییێتی.

**پشێوێتی**: پشێوی.

**پف** (فە.، باک.، ڕۆژ.، دەر.): سـیپەلاک، سـیپەلک. فـوو. ـــ دان: فوودانی هەمبانـە و کونـدە وئیتر. ـــ کردن: فووکـردن، فوولێکـردن. ـــ لەکاتی دڵتێکچوونیشدا بەکاردەبرێ.

**پفە**: فە، چێشت (لە زاراوەی منداڵانی ساوادا).

**پفەپف**: فووفوو، دەنگی فوولێکردن و کوژاندنەوەی چرایانە.

**پفەڵ**: چتی فش و فۆڵ.

**پف پیاکردن**: فوولێکردن.

**پفت** (باک.): پف: بـارامگۆ ـــ و ئـاگر ڤـەمراندن: بـارام گوتـی پـف و ئاگرەکەی کوژاندەوە.

**پفدان**: فـوودان، بـاتێکردنی هـیزە یـا ئـاژاڵی سـەربڕاو تـا پێسـتەکەی بکورێت و دایاڵی بۆ هیزە و مەشکە و کوندە و چتی وا.

**پفدریاگ**: فوودراو.

**پفک**: ترترێن، ئاغزی تفەنگ، تفەنگی بایی کە گوللەی دار یا قوڕ و گڵی پێداوێن بەفوو تێکردن.

**پفکە** (هەو.): بلۆق، پۆرگ، پفڵە، پفڵەک. ئەو شوێنانەیە لـە پێسـتی لەشی مرۆی، کە هەڵدەتۆقێ سا لەبەر سووتانی یا لەبەر زەبری چتان و یا لە قەراغ برینان پەیدا دەبێ، کە بدرێ ئاوی لێدێ. (باڵە.) ئاوورگ.

**پفکەدار**: بلۆقدار. ـــ ی: بلۆقداری.

**پفڵە** (فە.): کیس، بلۆق.

**پفڵەک** (باد.): بلۆق.

**پفوو** (هەورا.): فوو.

**پفەهەڵدان:** فووکردنی چتێک و هەڵاَمساندنی ئاوساو.

**پفەهەڵدراو:** چتی فوودراو، ئاژاڵی فوودراو.

**پف:** دەنگی ترپیە، دەنگی مێشییە، دەنگی گوللەیە. (باک.) پف، فوو.
ـــ لێکردن: فوولێ کردن.

**پفت** (باک.): پرت، تر.

**پفتک** (باک.): گیایەکە.

**پفۆک:** باڵۆن، باڵافر،فڕۆک، فرندە.

**پفلک** (باک.): پارچۆڵکەکانی گیانلەبەرانی حەوایی.

**پک** (موک.): لای پشتەوەی جگیە، واتا لاقۆزەکەیەتی، پشتە.

**پکێت** (باک.): قایم، مەحکەم، پتەو.

**پگر** (ئەردە.): کەمرە، گەمرە.

**پل:** (موک.): پارچە، کوت، کرتک، وولمە، پەل، پشک (تەنها بۆ گۆشتییە). (باک.، سوور.) قامک، پت،ـــ دان: بە قامکی لێدان. قوون، کوون، قنگ. چڵ، ئازار، ئێش.ـــ دان: بزوو و لێدانی شوارۆ. فیشقەکردنی تۆوی مرۆیە لە نێو قامیشیدا بۆ دەرەوە. (موک.) کۆم، نێوی قوونییە، (هەورا.) سوورە. (زا.، رەوا.) پۆز. (باد.) پندرۆک. پەڕی باڵندە. (باک.) بۆ پاڵپشت بەکاردەبرێ وەکوو شل و پل. (ئەردە.) پلە، بە دوو قامکان پلە لێدان. تاو، خول، سوور، با (تاودان، خول و بادان).

**پڵ** (ڕژ.): پەڵە، خاڵ، نیتکی ڕەش و سپی. زمان. ڕوو. چڵ، ئازار، ئێش، لێدانی دەمار و ڕەگی ئەندام.

**پلار:** پللار. (هەورا.، بابا.، زەن.) پەلار. (بابا.، جا.) پرگە. کوڵە برک. کورتە دارێکە بەکەسێک یا بە چتێکدابدرێ.ـــ ئاوێژتن: بەرد ئاوێژتن. قولـەدار پێداادان. تانە، تانووت، لاتاو، تووانج، تەشەرە، تەووس، پلارەقسە.

**پلارەقسە:** تانە، تانووت، تووانج، تەشەر، تەووس.

**پلارتێگرتن:** تووانج لە یەکێک گردتن. پلار بە کەسێک یابە چتێکی دادان.

**پلاس** (هەورا.): پەلاس، ژێرە خەرێکە وەکوو بەڕە لە مووی بزن دروستەکرێ، جاجمی سپی.

**پلاسماسی:** جوورە ماسییەکە وەک سفرە خۆی دەکاتەوە لەسەر ئاو بۆ ئەوەی هەر مێش و زیندەوارێکی لێبنیشێ بیخوا.

**پلاش** (ئەردە.): پووش و پەلاش.

**پلاف** (باد.): پلاف.

**پلان:** (باک.) پلان. پیلان، دۆلاب. (ئەردە.) ئێسقان، ئێسک.

**پلانن** (ئەردە.): تلدان بە چت، خولاندنەوە.

**پلاندنەوە** (ئەردە.): تلاندنەوە، خلۆرکردنەوە. تێوەدان، ساوین، ناوین.

**پلانەوە:** تلاندنەوە.

**پلاو:** پەڵەو، (دەر.) پەلاو، (کە.) لەپە، چێشتێکە لە برنج و یا ساوار یاگەنمە کوتاو یان لە هەرشتە و ڕۆن بە پەیتی دروستەکرێت و ڕۆنی بەسەردا دەکرێت.

**پلاو بامیە:** پلاوێکە خۆرشتی بامیە بێ.

**پلاوپارزن:** ماکێش، پلاوپاڵێو، (هەو.) پارزۆنگ، پلاوپەز، سووزمە، پلاوپاڕێن، چتێکە وەکوو سەلە لە شوولی دارەبی و نیتر چنراوە، پلاوی پێ دەپاڵێوون. سەلە یا قاپێکی کونکونە پلاوی پێ دەپاڵێورێ.

**پلاوپارێن:** پلاوپاڵێو.

**پلاوپالاو** (ئەردە.): پلاوپاڵێو.

**پلاوپاڵێو:** پلاوپارزن.

**پلاوپەز:** پلاوپارزن، سووزمە، پلاوپاڵێو، پلاو پارێن.

**پلاوپلاو:** جوورە گەمەیێکە هەر کەسەی دەبێ دەجاران لەسەر یەکتری بە دەنگی بەرز بڵێ پلاو بەلام جار لەگەڵ جارێ دەبێ دەنگی بەرزترکاتەوە.

**پلاوپێو:** مرازێکە بۆ پێوانی پلاو.

**پلاوساوار:** (باک.) سمت.

**پلاوماش** (هەورا.): پلاوێکە لە ماش و برنجی دروستەکرێ.

**پلە:** بۆ (کۆ) دەڵێن پلەکان، پایە (دەر.) پابلقە، پایە. جێگا پێی نێردیوان و پلەکان. بەقامکی گەورە و هەڵمەقووتە ـــ لێدان. (هەو.) بستە. (هەو.) بۆ پوور بەکاردەبرێ لەکاتی ئاخۆتن و ووتوو وێژیدا. (باک.) پەڵە. ڕێز، پایە، پایەگا. پا، دەرفەت. جوورە گەمەیێکە.

**پلە پرتکێ** (ئەردە.): پەلەپرووزێ، پەلەپەل، تالووکە.

**پلەپلە:** پایەپایە.

**پلەترازیان** (ئەردە.): پەشیمان بوونەوە، شلبوونەوە. لە پلە دەرچوون، کەللا لە نێو قامکان تێپەرین.

**پلەتسیان** (ئەردە.): لە پلەترازان، کەللا لەنێو قامکان دەرپەرین.

**پلەزیقان** (ئەردە.): خۆشی خۆشی.

**پلەکان:** بە پلەی نەردیوان یا پلیکانان دەڵێن. دۆخ. (زەن.) پایە. (دەر.) پابلقە. پلیکان.

**پلەکانە:** پلیکان.

**پلەمەتە** (ئەردە.): مەتەی دارتاشان.

**پلە مەتێ** (ئەردە.): مەتی و کەوان.

**پلەندەر:** لاپرەسەنی، مرومووشکەر، مووشەک، خۆتێ هەڵقوتێن.

**پلەنیان:** هانە هاندانی یەکێک.

**پلەوەر** (بابا.): سەرکەوتن، بەرزبوونەوە. ئارەزووی ـــ: ئارەزووی سەرکەوتن.

**پلە وگەرما و سەرەوای** (هەورا.): پلەی گەرما و سەرمایە.

**پلەی بارەنە:** ڕادەی باران.

**پلەی سەدی:** پایەی سەدی.

**پلەی گەرمایە:** ڕادەی گەرما.

**پلپ:** مەردومی بێ کەڵک.

**پلپ بەستن:** مەیین، توندبوونی شلەمەنی.

**پلێخان** (باک.): کوڵان.

**پلێخاندن** (باک.): کولاندن. بپلخینه.

**پلیخین** (باک.): کولین. بپلپخه.

**پلێسکیان** (ئەردە.): نەخۆشی باڵە شۆڕێ.

**پلپل**: کوتکوت، پارچەپارچە، پەلپەل تەنها بۆ گۆشت هەیە. ـــ بوون: پەلپەل و پارچەپارچەبوون. ـــ کردن: پەلپەل و پارچە پارچەکردن.

**پڵپڵ**: پەڵەپەڵە، خاڵخاڵ، خاڵاوی، پنک پنک وەکوو پڵنگی. پەڵاوی، پەڵپەڵاوی.

**پلپله** (باک.): پەپوولە. پرپرەی گوواره‌و ئیتر.

**پڵپڵە** (ڕۆژ.، شار.): پرپرەی گوواره و ئیتر. پرپرەی بەرموور و چتی وا بەسەری ژنانەوە.

**پڵپڵێ** (ڕۆژ.): خاڵاوی، بە پەڵەپەڵە و شکلی ڕەش و سوور نەخشاو وەکوو پێستی پڵنگی.

**پلپلێ** (باک.): چەنە سووک، زۆر بلێ.

**پڵپێنە**: پرپرە، جوورە گیایەکە.

**پلتانگ** (باک.): پەپوولە.

**پڵتە**: پەڵتە. (ڕۆژ.) بقە. تلپەی چت، تڵپەی چتی کوشراو. ـــ ی زار؛ مرۆی بێ ددان لە ئاخەفتندا ـــ ی لێوەدێ. دەنگێکە لەکاتی هێنانە دەرەوەی چتێک لەنێو چتێکی تردا پەیدادەبێ بە نهێنی.

**پڵتەپڵت**: پەڵتەپەڵتی زار. (ڕۆژ.) بقەبق.

**پڵتەقاندن**: چەقەنە لێدان.

**پلتەقانن**: قامک تەقاندن.

**پلتەقێن** (ئەردە.): چەقەنە لێدەر.

**پڵتۆک** (هەورا.): پڵتە لێدان بە دوو قامکان. پتە. پەلەپیتکەیە بە پشتی قامکێکی.

**پڵچ** (ئەردە.): پان. فلچ. (هەورا.) گێووژ.

**پڵچاندن** (ئەردە.): پانکردنەوە.

**پڵچاندنەوە**: پانکردنەوە.

**پڵچانن**: پانکردنەوە.

**پڵچی** (هەو.): گێووژ.

**پڵحەتکە**: ئەنگێوە، نیشانچی. کەسێکە لە مەڕ مەڕێنیدا ئەنگێوە بێ وە تیری خۆی بەهەدەر نەدات.

**پڵخ**: (زەن.) پڵق.

**پڵخان**: پوورخان.

**پلخانەوە**: پوورخانەوە.

**پڵخاندن**: پوورخاندن.

**پڵخاندنەوە**: پوورخاندنەوە. پەلخاندنەوە. (باک.) ڤەپەلاخستن، پەلاخستن.

**پلدان**: چڵدانی برین و ئیدیکەیە. (بابا.) تلدان. (فە.) وورک. بزووتنی ڕەگ و دەمارانە. (ڕۆژ.) فیشقەکردنی توخمی پیاو لەناو قامیشییەوە بۆ دەرەوە.

**پلدی** (باک.): ڕەشانک. ووشکە ڕن.

**پڵق** (زەن.): پڵخ.

**پڵقۆزە**: (موک.) پاڵقۆزە، (بابا.) مام جیژنۆکە، (گەر.) کەچەرە، (هەورا.، سەق.) مەتی، گیایەکە تۆزێک تیژە و دەخورێ.

**پلک**: (هەورا.) پوور. (لو.) پیس.

**پلکانەوە** (ڕۆژ.): تلانەوە، گەوزین، گەوزان، گلمان، گلملان. بارێکە ووڵاخ لەناو زبڵیدا خۆی دەگەوزێنێ و یا مرۆیە، کە خۆی ئەم دیوەودیو دەکات.

**پلکاندن** (ڕۆژ.): گەوزاندن، تلاندن.

**پلکانن** (ڕۆژ.): گەوزاندن، پلانن.

**پلک زا** (هەو.): پوورزا.

**پڵکن** (ڕۆژ): چڵکن.

**پلکیان**: تلخواردن، گەوزان، تلیان.

**پل لێدان**: پلتەقاندن.

**پلم** (باک.): توووند خوو، مۆن، گرژ. ـــ کرن: مۆن و گرژبوون.

**پڵمان**: بۆڵە.

**پڵماندن**: ووتە ئاشکرا نەکردن، بۆڵەکردن.

**پڵمە** (ئەردە.): پرمە، دەنگی لووتی چارەوێیە. پرمەی گریانێ.

**پڵمەتێ**: مەتێ و کەوان.

**پڵمەڕوو** (باک.): بەدخوو، بەدڕەفتار.

**پلمژیاگ**: چتی پەژمووردە.

**پلند** (باک.): گرێی هەرە خووارەوەی برپرەی پشتێیە.

پڵنگ

**پڵندار**: قوڵە دارێکە دەگیرێتە داری بەرز تا بەرەکەی بکەوێتە خووارێ.

**پڵنگ**: (هەورا.) پاڵینگ، جانەوەرێکە زۆر وە پشیلەی دەچێ بەڵان زۆر گەورەتر و پنۆکپنۆکە، لە جانەوەرە هەرە دڕندە و پڕسام و هەراسدارەکانە، سەرەڕای ئەوەش جانەوەرێکی زۆر مەرد و پڕ ئابڕوو و دادگەرە خۆی لە ئافرەت و منداڵ و پیران ناگەیەنێ، هەر چەکدارێکیش، کە ئەوی دیت چەکەکەی فڕێدا خۆی تێ ناگەیەنێ. هەر ووڵاخێکی بۆنی میزی وی بکات ئەژنۆی دەلەرزێ و توانای ڕۆیشتنی نامێنێ. کە ڕاوێ بکا لە سەر ڕێگای نێچیران میزی دەکا، کە نێچیران بۆنی میزەکەیان کرد لا ڕێ دەبن و هەر بۆخۆیان دەچنە لای پڵنگەکە ئەویش دووای کوژتنیان بە کاتژمێرێکی دەیانخووا.

**پڵنگیان**: ئاڵۆزبوونی موو.

**پڵنگی** : پڵپڵی، پەڵەپەڵە.

**پل وەشاندن**: تیرە کێشان، جووڕین، دەست وەشاندن.

**پلووپا** (ئەردە.): قاچ و قول. هەووڵ، تێکۆشان. توانایی، پەڕوپۆ (بۆ ڕێگا ڕۆیشتن).

**پلۆبش** (باک.): گیایەکە.

**پلووپۆ**: کەوتنە سەر فاک و فیکی کارێکی، هەوەس، سەودا؛ ـــ ی ژن هێنانی پێ کەوتووە.

**پڵووپووش** (هەورا.): پڕوپووش، پووش و پەڵاش، پڕ و پووشی ناوماڵ.

**پلووچ** (خۆ.): پاککردنی تیکوڵە شینەکەی گوێز و بادەم. بەو بادام و گوێزە پەلک شینە لێکراوانەش دەڵێن ـــ . ناڕاست، خووار، نادروست.

**پلۆر** (باک.): بەستوو (ئاو). (زا.) پەڵوولە.

**پلوور**: پلووسک. شمشاڵ.

**پلووره**: دووبارەی هەنگووین، کـە شـانەی تیـدا لـیّ دەدات بـۆ دروسـتکردنی هـەنگووین. (هـەورا.) پلووسـک. چتێکـی بۆشـە هەنگ شانەی تێدا هەڵدەبەستیّ، کوورەی هەنگانە.

**پلوورەوارانیّ** (هەورا.): کۆلکە زێڕینە.

**پلوورژەن** (ئەردە.): بلووێر لێدەر.

**پلووسک**: سوولاووک، لووساووک. (هەورا.) پلـووره. (دەر.) سـوولـک. (بـاک.) بۆختـک، چـەمبلوولـک. سوولـی، مـــەرزم، شـرک، مــەرزووب. ئەوەیە کە ئاوی باراناوی لە سەربانانەوە پێدا دێتە خواریّ و یـا ئـاوی پێـدا دەچێتە نێو حەوز و شوێنی ترەوە. پرژ، تاڤگە، سوولاڤ.

**پلووسکە** (هەورا.): سۆرینە.

**پلووکاتی** (باک.): دەست پێوەگرتن.

**پلووسگرد** (هەورا.): پەڕەسلێرکە.

**پلۆ گەرمی و سەردی** (هەورا.): پلەی گەرمی و ساردی.

**پلیان** (ئەردە.): خلۆربوونەوە، گلان و کەوتن لە سوواربیەوە.

**پڵیت**: بلیت، پسوولـە، پارچە کاغەزێکە لـە سینەما و شوێنـی وا دەدریّ بە مرۆڤ.

**پلیت**: (مـوک.) تیتـک. (هـەورا.) نووێرد. سـەری دوو پارچـەی پێکـەوە هەڵدرواو بەجووتی بنووشتێنرێتەوە و دیسان بدروێن.

**پڵیتە**: فتیلـە، پۆرک، پۆرت، فتیلـک، پتیلـە. چتێکـی بادراوە، کـە لـە چتێکـی تر هەڵکێشریّ.

**پڵیتەکێش**: دارێکی سەر لەلە کراوە پلیتەی پیّ هەڵدەکێشریّ.

**پڵیخانەوە**: (باک.) پەرخین، ڕزانەوە، داپڵۆخان، پەتشان.

**پڵیخاندنـەوە**: (بـاک.) پـەرخاندن، پـەلخاندن، ڕزاندنـەوە، پەتشـاندن، داپڵۆخاندنەوە.

**پلیزگرد** (هەورا.): پەڕەسلێرکە.

**پلیسە** (زەن.): پەڕەسلێرکە.

**پلیسرگ**: پەڕەسلێرکە، پەڕەسێلکە.

**پلیسگەرد** (هەورا.): پەڕەسلێرکە.

**پڵیشان**: فلیقان.

**پڵیشـانەوە**: فلیقانـەوە، پانبوونـەوەی چتێـک بـەهۆی قورسـاییەکەوە، کـە بکەویّ بەسەریدا.

**پڵیشاندنەوە**: فلیقاندنەوە، پانکردنەوەی چتێک بە هۆی قورساییەکەوە.

**پڵیشاوە**: فلیقاوەوە، پانبووەوە.

**پلیف** (باک.): گۆی خڕ.

**پلیقان**: فلیقان.

**پلیقاندن** (دەر.): فلیقاندنەوە.

**پلیک**: پلیکان، پێپیلکە. (باد.) هەلووک.

**پلیکان**: پلەکان، پلیـک، پیّ پیلکە، کە داریـیّ. پەرەسە، پایە، پلە، پابلقە. (بـاد.) پـیّ پـەلاس، پێسـتر، پێسـترک. (وان) مـەردەوان، کـە لـە قـوڕ و خشت بیّ.

**پلیکانە**: پیّ پیلکە.

**پلیکانیّ** (باد.): هەلووکێن.

**پلیکە**: پلیکانە.

**پن** (باک.): (باک.) زچ. نوختە. بڕکـەی شـووتی و ئیـتر. کـەد و توولـەی لکە گیایانە، کە بە زەویدا بلاّودەبێتەوە.

**پنار**: (بار.) بناری کێوی. (باک.) سەرچاوە.

**پنە**: (کە.) دەرخوانە، (ئاک.) خانک، (دەر.، هەورا.، ڕەوا.) خووانە، (باڵـە.) دۆشـەگەی نـانی. (هـەو.) فەرشـە، (هـەورا.) پـنی، (کـۆ.) ڕەپکە، چتێکی پان و خڕە لـە دار یا لـە گێچ دروسـتدەکریّ ئـەنگوتکی هەویری لەسەر پان دەکرێتەوە.

**پنەپیتۆ** (خۆ.): (ڕەوا.) پیرەپتۆن. (موک.) سەرەسۆدرە.

**پنەدای** (هەورا.): پێدان.

**پنەزانای** (هەورا.): سوپاسکردن.

**پنەشۆر** (هەورا.): پێشۆر (سابوون).

**پنەکتکە**: جوورە مارێکە.

**پنەیوان** (هەورا.): پێگەیشتوو.

**پنەیوانای** (هەورا.): پێگەیاندن.

**پنپنی** (باک.): پنک پنک، پەڵەپەڵە، بەڵەک.

**پنت**: پند، حەمحەم.

**پنتک** (ڕۆژ.): پرتکە گوو و چتی پیس.

**پنتی**: کەسێکە زۆر گوویّ نەداتە پاک و خاوێنی و خۆڕێکخستن. (باک.) ڕژد، چرووک، لەچەر، ڕیسوا.

**پنج**: چـەند لکـە دار و یا گیایـە، کە لـە کۆلکـە و بنـی کۆن دەری بکـات، دەغلّ و گژ و گیاش، کە شینبوو دەبێتە پنج، کە گەورە و بڵند بـوو چڵی پیّ دەڵێـن. ـــ کردن: ڕاوەستانی زگ لـە ڕەوانـی. ـــ ە گیـا: ڕەگ و ڕیشـەی ڕووەک و گژو گیایانـە. پنچـک، گیایەکیشـە، کە سـەری لـە زەوی هێنایـە دەرەوە چەند کەدە و لقێکی دەربکات. دەرمانێکە برێتییە لە قسڵ و لۆکـە کۆن و پیو بۆ پینە کردنی دیزە و گۆزەی شکاو و گونجی ئاو. پنجداڕوو. ـــ کردنـی دیـزە و گـۆزە و کووپـە و ئـەو کـەل و پەلانـەی، کـە لـە قـوڕ دروستدەکرێن. مەبەس لە چارەکردنی کاروباریشە.

**پنجار** (بار.، وان.، باک.): سەوزەوات. گیـاوگۆلی خواردنـیّ، گیـای سوورکراوەوە واتا پنج بۆ ژار و هەژار.

**پنچک**: پنج، پنچکی گیایان، بنچک. پرچک، لـق و پۆپی دارانـە. داری کورت و لق و پۆپی دارە، کوورس، خورێل، دەوەن، دەرخ، کێزر.

**پنچکە کەرانە**: گیایەکە پنچکەکەی ڕەق و پتەوە کەری پێدەبەسترێتەوە.

**پنجکردن**: گرتنی کونی دیزە و گۆزە و کووپە و ئیتر. پینەکردن.

**پند**: (باک.) جاڵجاڵووکە. پندەپیر. (زا.) قوون، قنـگ، کوون. (خۆ.) پندریسکە (باڵندەیەکە). (هەو.، کە.) حەمحەم. (دەر.) پنت. نەسـپێی باڵندەی کەوی و کێوییە بەکەمێڵە لاق و بـاڵ و جێگایـانی تری دادەگریّ، بـە ئـاوی دەمـاری توتنـیّ چـارەی دەکریّ. هـەر لـەو چەشـنەش پنـد هەیـە تووشی لەشی مرۆیانیش دێت بەبن مووەکانیدا دەچێتە ناو گۆشتییەوە، بە تراشین و دەرمـانی گـەرماویش چـارەی نـەکراوە، بـەلاّن تـەنها سـورخی فەقێیان کەمێک لەنێو ئاووری داوێن، مرۆیەکەش چتێکی وەکوو کراسی

ژنان لەبەردەکات لەسەر ئاوورەکە هەڵدەتروشکێ دەبێ نەیەڵێ بۆنی سورخەکە بە دەم و چاویدا بچێ چونکوو زیان بە ددان و چاوان دەگەیەنێ. پندی مرۆیان ڕشک دەکات و بە مووانەوە دەنووسێن دووایە بە قەدەر ئەسپێیەکیان لێدێ و بە بنی مووەکاندا دەچنە خوواریێ ئێجگار بە خارش و ئێش و ئۆف و ژان و ژووانە. (هەورا.، دەر.، هەو.، زەن.) چنگنە.

**پندە**: نێوی دەنگە. پرتەپرتی پیاو و ژنانە.

**پندەپند**: پرتەپرت.

**پندر**: پتەو، مەیلەو ووشک، (هەورا.) پەنر. ــ بوونەوە: چەقینەوە. (دەر.) پەندیرە. پنج. ــ بوونەوەی زگ: ڕاوەستانی زگ لە ڕەوانی. ــ کردن: پنجکردن.

**پندربوونەوە**: چەقینەوە، ووشک و کزربوونەوە. ڕاوەستانی زگ لە چوونێ.

**پندرپۆزە** (باک.، باد.): گیایەکە لە قەراخ جۆگەلان شین دەبێ، نێرتکەکەی هەڵدەکێشن و سپی دەکەن و دەیخۆن، شیرینە.

**پندرۆک** (باد.): (موک.) پل، کۆم، نێوی قوونی مرۆڤانە.

**پندریسک** (ڕەوا.): باڵندەیێکی چکۆڵە و بۆر و تیژڕۆیە و چەنگاڵی تیژن لەنێو دڕک و داڵاندا دەژی. (ڕەوا.) چکچکە. (کۆ.) فندەگولە. بۆ کەسێکیش بەکاردەبرێ لە کاروبار و ڕۆیشتنیدا توند و تۆڵ بێ. چەقەسوو. ئەسپێی باڵندانە، پند.

**پنر** (هەورا.): پندر، توند و کرژ کردنەوەی پێستی چاو بەهۆی مازوو و تیکوڵە هەنارەوە وەکوو کوندە و مەشکە، کە تاڵاو دەدرێن، کە خاوو بێ تام و بۆنی ناخۆشە، بەڵام لە پاش تاڵدان تام و بۆنی خۆشدەبێ.

پندریسک

**پنری**: گیر، تامی گیر.

**پنس**: (شەبە.، ڕۆژ) کەپەک.

**پنک**: خاڵ، پەڵە، نیشانە. پنت.

**پنکاڤ** (زا.): گولاو.

**پنکە**: بڕوانە: پنک.

**پنکە هەور**: پارچە هەورێکی گچکە.

**پنک پنک**: خاڵخاڵ، پەڵەپەڵە، پنپن، پنۆک پنۆک، کانگ.

**پنکدار**: نیشانەدار، خاڵدار، پەڵەدار. ــ ی: نیشانەداری، خاڵداری، پەڵەداری.

**پنگ**: (دەر.) پونگ. (هەورا.) پونگە. (باک.) پەنگ. گیایەکە لە دەم ئاوان شین دەبێ لەنێو چەند جوورە چێشتێکیدا بەکاردەبرێ و نارەقیشی دەگیرێ. بە ووشکی و ووردکراوی بە برین وەردەکرێ چاکی دەکاتەوە، بە ماستاو یا بە ئاوەوە بخورێ بۆ زەحیری زۆر باشە. (فە.) پینە.

**پنگاڤ** (باک.): پەنگاف.

**پنگان** (ڕەوا.): زویر و توورەبوون، دڵگیربوون.

**پنگانەوە**: پەنگانەوەی ئاو، پەنگخوواردنەوەی ئاو. (هەورا.) پەنگانەوە، (دەر.) پەنگیانەوە. پرینگانەوە لە شەڕ.

**پنگاندنەوە**: پەنگاندنەوەی ئاو، گرتنی پێش ئاو.

**پنگە**: پنک، پونک.

**پنگخوواردنەوە** (ڕۆژ.): مات و کزبوون، تێکچوون.

**پنگر**: پندر، پەنگر.

**پنگربوونەوە**: پندربوونەوە.

**پنگرکێش**: ماشە، مەقاش.

**پنۆرە**: (باڵە.) دارێکی درێژی دوولکە لە کاری دڕک و داڵاندا بەکاردەبرێ.

**پنۆک**: خاڵ و پەڵەی وورد لەچتاندا.

**پنۆک پنۆک**: پنک پنک.

**پنی** (باک.): ڕاز، نهێنی، پەنهان. (باد.) پینە.

**پنێ** (هەورا.): پنە.

**پنیا** (ڕۆژ.): پینە و پەڕۆ.

**پنیک**: گیایەکە.

**پنیۆز** (باد.): ڕۆیشتن لە شوێنێک بۆ چەند دەمێکی. ــ دەکەم: واتە ئێستا دەڕۆم لە پاش دەمێکی تر دێمەوە.

**پنیۆس**: بۆ ماڵیاوایی بەکاردەبرێ لە وەڵامیش هەر ئەو دووپاتە دەکرێتەوە.

**پۆ** (خۆ.): بوختان. تووک و پەڕی باڵندان. داوی ڕووشە وکێشە و کێچەڵ و تەڵەزگە. ڕدێ، لە جۆلاییدا. (دزە.، هەو.) چێرک. ئەو ڕیشووە براوانەیە، کە بەسەر داری تەونییەوە دەمێنێتەوە. ئەو چتەیە، کە لەسەر ڕایەڵ دەتەنرێ. (شاگی.) چێرگ. ــ شکاندن: سەرکێشی، پێدرێژی.

**پۆرتکان**: تێکچوون، ڕزین. لق و پۆپ.

**پۆزەخووگە**: جوورە بەرێکی دارە مازوویە وە لمووزی بەرازی دەچێ.

**پۆو**: بریتییە لەوەی، کە لەسەر ڕایەڵ دەتەنرێت. دژی ڕایەڵە.

**پوو** (شکا.، شەم.): پووک. (ئەردە.) پەڕۆ، پووشو. دەستەچیلە.

**پووار** (جا.): پووس، گیای ووشک، ڕزیو، چتی زۆر ڕزیو؛ ئەو دارە ئەوەندە ڕزیوە بووە بە پووار.

**پووارتک**: ڕزیوی ناوداری گەندەڵ.

**پووز** (شا.، بابا.): هۆرە، زوورانە. (خۆ.) زەمۆمە.

**پووزک** (بابا.): تەنێکی تایبەتییە لە ئەندازیارێتیدا.

**پووزناو**: دارێکی تۆزێ خووارە، سەرێکی پان و دادراوە، بەرداشی سەرووی پێ بەرزدەکرێتەوە بۆ ئەوەی گردەڵەی بخرێتە ژێر.

**پووان**: ڕزان، ڕزین، گەندەڵبوون.

**پووو** (هەورا.): دارێکە ڕووی لەشکان و کەوتن بێ، ڕزیو، گەندەڵ. (ڕەوا.) بەرقەپ.

**پووە** (ئەردە.): کەڕەپوو.

**پووەدای** (هەورا.): پێوەدانی دەرک و پەنجەرە و ئیتر. (هەورا.) دای پۆ.

**پووەنیای** (هەورا.): پێوەنان.

**پۆبڕ**: توندکردنەوەی ڕایەڵی تەونە بە جۆرێکی وا، کە پۆی پێدادەچێ.

**پۆوبڕ**: بریتییە لە تونکردنەوەی ڕایەڵی تەون بە جۆرێکی وا پۆی پێدا نەچێت.

**پۆپ** (سەقز.، ڕۆژ.): پرچی ژنانە، تووکی سەر، قژ و مووی سەر. پۆپ چەرمە: سەرسپی، بۆ ئافرەت. (باک.) پۆپەی کەڵەباب و مریشکان. نالەبار، ناهەموار. ژنی قژن. تۆقەسەری کەژو درەخت ومرۆڤان.

**پۆپانە** (زەن.): پۆپە.

**پۆپە:** (باک.) پۆپ، سەنگ، کیژی، (زەن.) پۆپانە، (دەر.) پۆپیتە، کیژی، کلاوە، برەک، پرەک، کلاژنە. تاجی کەڵەبابی، پۆپەی کەڵەباب و مریشک و قەلەموونەی. قەلەپۆپە، قولەپۆپە. سەرەوە و قیتکایی و بڵندایی هەرە سەری چیایان. ـــ ی لقی دار و هەر چتێکی بڵندبێ. ـــ ی کیژی: سەر گۆپکەی چووی مرۆیە. سەر ـــ: سەرچڵ (بۆ دار).

**پۆپەرەش:** ناژارێکی باڵندانە پۆپەیان رەش هەڵدەگێرێ و دەیکوژێ.

**پۆپەزمین** (ئەردە.): پۆپەشمین، چنراوێکی تەنکە لە خوری وەکوو جاجم.

**پۆپەشمین:** پێخەفێکی شاشی هاوینییە لە خوری رێسراوی باریک دروستدەکرێ.

**پۆپەوکەڵەشێری** (هەورا.): پۆپەی کەڵەبابی.

**پۆپ چەرمەوو:** سەرسپی، بۆ پیاو وژن.

**پۆپ چەرمگ:** سەر سپی، بۆ پیاو وژن.

**پووپر** (ئەردە.): قژ، پووپ، سەروپۆپر.

**پۆوپر:** بروانە: بۆوپر.

**پۆپکە:** پۆپە.

**پۆپن:** پۆپنە، سەربەکلاوە (بۆ باڵندە). کەسێکە ژنانیلە بێ و پرتەپرت و گۆتەگۆتی هەبێ. (خۆ.) ووردەکار، ووریا، لێ پێچەوە، کەسێکە زۆر لە هەموو چتێکی بپێچێتەوە.

**پۆپنە:** باڵندەی پۆپەدار. گۆشتێکی سووری برگە برگییە لەسەرسەری کەڵەباب و مریشک و قەلەموونە.

**پۆپنەکەڵەشێرە:** سەورڵ، گیایەکە گوڵەکەی وەکوو پۆپەی کەڵەشێری سوور و پەرەدارە.

**پۆپیتە** (دەر.): پۆپەی کەڵەباب.

**پۆت:** زنجیر. درۆ. دروومانێکە رێک و پێک نەبێ بەڵکوو گرژ و لۆچی پەیدابێ. شەلاڵە. (رەوا.) پۆتە. لۆچ. (باک.) پەڕۆی رزیو. (باک.) شەرم، شەرمەزاری. ـــ کەتن: بە شەرم داکەوتن. ـــ خستن: بەشەرم داخستن. پووتەڵ، پووچەڵ، کووێر، پووچ. (سال.) خۆڵ، گڵی وورد. گزرە گیایەکی ووشک و هەڵچنراوە بۆ زستانێ ئاژالان.

**پووت:** باتمان. (موک.) هەشت سێ (٨ هۆقە) یە: ١٦ کیلۆیە. (بار.) نەرمەی باسکی مرۆڤان. (هەو.) لاواز، لەڕ، پووچەڵ، رەنگزەرد. (باد.) بوت. (باک.) باقە گیای ووشک، (باک.) ریسی. پووشکە. پووچ، پووتەڵ، هوڵوڵ. گزر، گیایەکی نیشکە دەکرێتە گیشە بۆ تالیکی ئاژالان لە زستانێدا.

**پووتانەوە:** چرووسانەوە، چرمسانەوە.

**پووتاندنەوە** (سور.): چرووساندنەوە، چرمسانەوە. رووتاندنەوە. پچەڕاندنی نان.

**پۆتە** (باد.): خەبات. ـــ دان: خەفتان، لێخەفتان. (باک.) بەرکەتی. گزنک. (رەوا.) پرژ، تاڤگە.

**پۆتەراک:** پۆتراک، سەروپۆتراک.

**پۆتەکە** (هەورا.): کەلەکە (بۆ وولاخ). گزنگ، بەرکەتی.

**پۆتەگا** (ئەردە.): کەلەکە، هەنگڵ، پاڵوو، بنەگڵ.

**پووتەڵ** (هەورا.): پووچ، پووچەڵ (بۆ مرۆ و گوێز).

**پۆتەڵ:** پووچەڵ.

**پۆتەلاک:** سەروپێچ.

**پوت پارێز** (باک.): بوت پەرست. ـــ ی: بوت پەرسی.

**پۆتپۆت** (باک.): پتپتە. قسەی پرووپووچ و بێ واتا.

**پۆتراک:** سەروپۆتراک، سەروگوێلاک، پۆت، پووتک، سەکوت، سەروپۆتەراک، (هەورا.) تیلاک.

**پۆتک:** کۆنە، بەرگی کۆن و دڕاو.

**پووتک** (باک.): دەزگرەی ناشپەزان. (ئەردە.) خۆرە، نەخۆشی و دەردێکە.

**پووتڵ:** پوروچ.

**پۆتلاک:** پۆتەلاک.

**پۆتین:** جوورە قۆندەرەیەکی لاسکدارە بە قەیتان دادەخرێ، نیوە چەکمە.

**پووچ:** قسەی بێ هوودە. پووت، بێ نرخ، بەتاڵ، (هەورا.، زەن.) نێو بەتاڵ، پووک، (باک.)، پووچەراخ، تەووش، کلۆر، پووچەک، پووچەڵ. چتی بێ ناوک و پووک (بۆ گوێز و بادەم). ـــ بوون. ـــ کردن. ـــ کردنەوە: رەشکردنەوە.

**پووچاتی** (باک.): پووچی.

**پووچانەوە:** پووکانەوە.

**پووچاندنەوە:** پووکاندنەوە.

**پووچەراخ** (باک.): پووچ.

**پووچەک:** پووچەڵی دانەوێڵە و چتی تر. چتی پووک و بێ ناوک.

**پووچەڵ:** پووچ، رزۆک، رزۆت، قرپۆک، پووت، پووتەڵ، هەڵوەرزک، پویچەڵ، (رۆژ.) سرەمۆک، (باک.) پووچەراخ. پووچەک. بۆ گوێز و بادەم و مێووژ و چتێکی نێوی پووچ بێ. دەردێکە لە دەخڵی بدات دەنکەکانی بێ زاد و پووچ دەکات؛ مرۆی پووچەڵ: نابووت، چووڕپرەپۆتە.

**پووچەوبوون:** پووچ بوونەوە.

**پووچەوکردن:** پووچ کردنەوە.

**پووچتر:** قرپۆکتر.

**پووچترین:** قرپۆکترین.

**پووچک** (باد.): پووچ، لە پووچ گچکەکراوەتەوە.

**پووچی:** پووچاتی، هیچ وپووچی.

**پۆخ:** گۆپکەی دار و درەختانە لە پێش پشکووتنیاندا. (بابا.) میوەی زۆر گەیشتوو.

**پووخ** (باد.): توڵخاوەوە (میوە). (رەوا.) رفۆک، چتێکە هەڵبەوەرێ و ناسک بێ. خاو. بە بنێشت و قەند و نیتریش دەڵێن، کە خاوبێتەوە و تێکبچێ. (ئەردە.) کێم، هەوا، پوورتخ.

**پۆخەرە:** پۆخەکە، کەرگوێلک. گیایەکە گەڵای وەکوو گەڵای کەنگری وایە، بەڵام هێندەی وی دڕاوی نییە، نێرتکەکەی میترێک بڵند دەبێ گوڵەکانیشی وەکوو هی شەکرۆکەیە.

**پۆخەکە:** جوورە پووشوێکە.

**پۆخەڵە** (کۆ.): کەرکۆڵ، جوورە گیایەکە.

**پوخت:** کولاو، پوختە، ئامادە، پژاو. ـــ بوون: کولان، پژان. ـــ کردن: کولاندن، پژاندن. رێک و پێک، خاوێن جووان، قاڵ. ـــ کردن: خاوێن و رێک و پێک کردن.

**پوختە:** کاروباری دروست و ساز و ڕێک و پێک، پوخت. ــ کردن: ڕێک و پێک کردن. کولاو.

**پوختەدەنی** (ئەردە.): کولاو، لێنراو.

**پوختەیی:** ڕێک و پێکی لە کاروباردا.

**پوخت و پەز:** چێشت لێنان. بڕیار، بەڵێن پێکدان.

**پوختی:** ڕێکی، خاوێنی.

**پۆخ دەرکەوتن:** نەنگ و شوورەیی وکێمی دەرکەوتن.

**پۆخەک:** (باک.) خشڵ، چەکی ژنان. (زا.) گوڵنگی فیس و کولاو.

**پۆخڵ:** چتی پیس و ناخاوێن.

**پووخڵ** (ئەردە.): کاڵ، نەگەیشتوو.

**پووخلکار:** سست، بوولە، پەخمە، پڕپوول، ناشی، سستکار.

**پۆخین:** (باک.) چێشتی جۆیە. (ڕەوا.) قاووت (ئاردی قەرەخەرمان). ئاردی زۆر ووردی بێژراو.

**پۆدای:** پێوەدان.

**پۆدڕە:** بۆدڕە.

**پۆدوو** (زا.): پەدووک، پووک.

**پۆڕ:** باڵندەیێکی بۆرە و لە کەوی چکۆڵەترە و گۆشتیشی خۆشترە، (کۆ.) کەناچە، (باک.) پۆڕی. تاجی سەری باڵندانە. پان؛ پان و پۆڕ. (زا.) کاکۆڵ، موو، پرچی سەر و قژی سەری مرۆیان.گوشاد، فراوان. (باک.) پرچ، تووک، قژ. (ئەردە.) پەڕ، تێکچڕژاو، بۆباخ ومێش و نێتر. باڵندەیێکی دەشتییە بە زۆری لە گوێی ئاو و شێینایدا دەژی، کونجە و گۆشت خۆشە هێندەی کەوێکییە، زڕەکەو.

**پوور:** (هەو.) پلک، (ڕۆژ.) تیتک، (ئەردە.، زەن.، دەر.) میمک، (ڕۆژ.، شەبە.) دێدە (کە خوشکی باب بێ)، بە خوشکی دایک و باوک دەڵێن ــ.

**پۆرەنگ** (باک.): جوورە خودییەکی پێشەگەرێتییە.

**پۆڕاڕۆیین:** بە پوورڕا ڕۆیین. چاوەدێری، بەندیواری.

**پۆڕەو:** چتی ڕێکخراو.

**پوورنایشۆکە** (موک.): گیایەکی دڕاوییە نێرتکەکەی بستێک بڵند دەبێ و گەڵای بە زەویدا بڵاو دەبێتەوە و شینە گوڵیشی وەکوو گوڵی شەکرۆکەی وایە.

**پوورە:** (موک.) شەڵغە. دەسە، دەستەهەنگ. کۆمەڵە بێچووە هەنگێکە لە بەهاراندا لە هەنگەکان جوێ دەبنەوە. زەی. ــ ی هەنگان: دەستەی مێشەنگووینانە. (ئەردە.) کەندو و خەڵفی مێشهەنگووینان.

**پوورەدان** (ئەردە.): فڕینی بێچووە هەنگان و کۆمەڵە بەستنیان.

**پوڕەسپی** (باک.): (پیر.) سەرسپی.

**پوورەهەنگ:** کوورەی هەنگ.

**پۆرت** (باک.): (باک.) پۆڕ. موو، تووک، ووردەتووک. پێهەڵکوتنێکی لە سنوور پتر.

**پوورت** (زاخ.، دهۆ.): تووکی سەر و ئێترە. (باک.) یاڵ.

**پۆرتخ** (ئەردە.): کێم، هەوا، زووخاو.

**پۆرتک** (ئەردە.): کلاو و دەسماڵی ژنانەیە.

**پوورتک** (زا.، دهۆ.): سەری پەنجە. (ڕۆژ.) مێزەر، پێچ. سەرو پۆتراک.

**پۆرتکان:** (ڕۆژ.) ڕزین، داوەشان، بێزیانی. بۆ کالاو چتی خوری و کەل و پەل بەکاردەبرێت.

**پوورتکان:** جل وبەرگی ڕزیو.

**پوورتکاو:** ڕزیو، ڕزاو، داوەشاو. بێزەوەر.

**پۆرچک** (هەکا.): تووکی سەری مرۆیانە، کە وەکوو کاکۆڵ بێ و هەموو سەری داگرتبێ.

**پوورخ:** توڵخ.

**پوورخان:** توڵخان، پڵخان.

**پوورخانەوە:** توڵخانەوە، پڵخانەوە.

**پوورخاندن:** توڵخاندن، پڵخاندن.

**پوورخاندنەوە:** توڵخاندنەوە.

**پۆڕخز:** گیانداری مۆنی سەهەندەی. لاساری مانگر. زل، زەلام.

**پووردز:** پیس، بەرچاو تەنگ.

**پۆڕ ڕەش** (باک.): قاوەیی ڕەنگ.

**پوورزا:** پلک زا، میمک زا، (ڕۆژ.) تیتک زا.

**پوورزازا:** منداڵی منداڵی پوور. نەوەی پوور.

**پۆرساندن** (باک.): کاوێژکردن.

**پۆڕسپی** (باک.): بەربووک.

**پۆڕقوت** (باک.): سەرتاش، سەرتراش.

**پۆڕک:** ناومالّی کۆچەران. دوو چیغی لوولەکراوی وایە، کە کرابێ بە بنبار. (بار.) جوورە مێشوولەیێکی کوێر و ڕەشە، (شار.) تەپۆ. (باک.) فتیلە و پلیتەی مووە. گیایەکە.

**پوورکە:** پوور.

**پۆرکوور** (باک.): بەدبەخت.

**پۆرگ:** (خۆ.) بلۆق، دلۆق، پفکە، (بابا.) تۆقلە، (دزە.، دەر.، ڕۆژ.) پۆقلە. ئەندامی مرۆ لەبەر سووتان یا ڕۆیشتن یا کار یا زەبر بلۆق بکات و پڕ ئاو بێ ــ ی پێدەڵێن، لەکەنار برینانیش دێ، کیس. توێژێکی ناسکی تەنکە بە سەر برین و هەندێ چتی ترەوە. بەرگی خونچە گوڵی نەپشکووتوو. تیکوڵی چەڵتووک و پەرشیە. نێرتکی قونێر و برینانە.

**پۆڕگ:** ناومالّی کۆچەران. بارێکە بن بارەکەی چیغ بێ.

**پۆرگەفەرەنگی:** جوورە بلۆقێکە لە نەخۆشی فەرەنگییەوە پەیدا دەبێ.

**پۆرگە نەرمۆکە:** (؟).

**پۆڕهەلەک** (باک.): کاکۆڵی قەفقەف، کرووزە.

**پۆڕێ:** ناوی ئافرەتانە.

**پۆری** (باک.): پۆڕ، جوورە باڵندەیەکە.

**پۆڕیان** (لو.): چتی ڕێک و پێک، کە بەکاربێت. (ئەردە.) گونجان.

**پۆڕین** (لو.): پۆڕیان، سکالا هەڵڕشتن، دەردی دڵ هەڵڕشتن.

**پۆز** (باک.): کەپۆ. (باک.) قوللەی کێوی. (باک.، جەلا.، شکا.، بار.، کۆ.، پر.، جا.، هەکا.) کەپۆ، لووت بۆ مرۆ، لمووز بۆ وولاخ و

ئاژاڵانە. دەوروبەری زار، پۆزە، قەپووز. (خۆ.) هۆرە. (بلـ.) فش و ئەستوور، فش و بڵاو.

**پووز:** گۆشتی بەلەک، بەلەک، نێوانی قوڵاپە و ئەژنۆ. (فە.) پیز. (ڕۆژ.) پوویز.

**پووزایی:** پیزی، پووزی.

**پۆزایی** (بلـ.): ئەستوورایی، فشی، بۆ جلک و گیرفان.

**پۆزە** (ڕۆژ.): دەم ولـووت ناشیرین، بە مرۆی بە فیز و خۆپەسەند و بۆ ئێستریش بەکاردەبرێ. (هەورا.) پازدە. لـووت، کۆسپایی. لمـوزی چارەوێ، دەوروبەری زار. لاواز، پووت.

**پووزە:** بڕوانە: پۆزە.

**پووزەبەن:** پووزەبەند.

**پووزەبەند:** چتێکە لە دەمی وولاخ دەکرێ بە تایبەتی لە گێرەدا بۆ بەستنی دەمی، قەمتەر، دەمبەس، دەمبەست.

**پووزەخووگە:** جوورێکە لە بەری دارە مازوو وەکوو لمۆزی بەراز وایە.

**پووزەر** (باک.): مووزەرد.

**پووزەوان:** پووزەوانە.

**پۆزەوانە:** پووزەوانە. ئاسنێکە دەخرێتە سەر لووتی وولاخ و ڕەشمەی پێ بەند دەکرێ.

**پووزەوانە** (ڕۆژ.): بەلەک پۆش. لاسکە گۆرەوی بەلەکێ بەبێ گۆرەوی. پەرو.

**پۆزبەران** (باک.): سەرخۆش.

**پۆز قەڵەم** (باک.): قەڵەمی نووکدار.

**پۆزگە:** دزەقە، دەمەنەی ئاسیاو. زەمبوورەک. کونی دۆلاشییە، کە ئاوی بە هێز لێدێتەدەرێ.

**پۆزنگان:** ڕزین.

**پووزان** (باک.): بیژان، گیایەکە.

**پۆژەنەی** (هەورا.): تێ ئاژەنین، تێ ئاخنین، تێراکردن.

**پۆژن:** خەم، پەرۆش.

**پۆژنای** (هەورا.): داپۆشین.

**پۆژنایەوە** (هەورا.): داپۆشین.

**پۆس** (هەورا.): پێست، کەوڵ. تێکوڵی دار و درەخت. پەیر: هەواڵی لاوو ـــ یان دەپرسم. توویک. پۆستە، قەرەوڵ، کێشکچی. تێکوڵ (هی هێلکە و نیتر)ی دار و نیتر، قەرەوڵ، کێشک. چەرم، کەوڵ. پێستی تەنک، مشن، تیمانج. چەپەر، پۆست.

**پووس** (فە.): پێست، کەوڵ. لـووس بەلان بەتەنێ بەکارنابرێ بەڵکوو دەڵێن لووس و پووس.

**پۆسانن:** پۆساندن، پرتووکاندن، خراوکردن.

**پۆسە** (زمن.): پۆس. پێست، پۆست، چەرم.

**پۆسەخانە:** پۆستەخانە.

**پۆس ئەرەمالیای** (هەورا.): پێست داماڵران.

**پۆس ئەرەمنیای** (هەورا.): پێست داماڵران.

**پۆسپارە:** پارچە پێستێک.

**پۆسپەنیر:** پێستی پەنیری، خیگەی پەنیری.

**پۆس پەنیر:** خیگە، زەلام، لەندەهۆر.

**پۆست** (باک.): پێست، کوورک، چەرم.

**پوستە:** پستە، جوورە بادەمێکی ناسکە.

**پۆستە:** چەپەر، تەتەر. نامە و پەیامێکە بە هۆی میرییەوە ڕەوانە بکرێ و بە خاوەندی بگەیەنرێ. ـــ چی: تەتەرکار، چەپەرچی.

**پۆستەخانە:** تەتەرخانە، چەپەرخانە. شوێنێکی تایبەتییە، کە پۆستەی تێدا دابەشکرێ.

**پۆستگرتنەوە:** کەوڵگرتنی گیاندار.

**پۆستنشین:** کەسێکە خۆی لەناو تەکیە و خانەقایاندا کرووژم هەڵێنابێ.

**پۆسخەتەنەگا:** خرووسە، خرووسا، پێستێکە دووای خەتەنە لە چووی منداڵان دەکرێتەوە.

**پۆسکە** (با.، کۆ.): دزەقەی ئاشی.

**پۆسکەنە:** پۆسکەندە، ئاشکرا، بێ پەردە.

**پۆسکەندە:** ڕیشە هەڵکەنراو، پۆستکەندە، بنە پێهێنان، چتێکە، کە زۆر چاک لێی کۆڵرابێتەوە و ئاشکرا کرابێ. ـــ کردن: لێکۆڵینەوە.

**پۆسکەندن** (فە.): پێست لێکردنەوەی لەشی گیانلەبەران بە گوروون بە بێ هەڵدڕین.

**پۆسکەنن:** پۆسەکەندن، پێست لێکردنەوە. پاشملە، لەپشتی سەر دووان.

**پۆسکرانەوە:** تێکوڵ کراندنەوە.

**پۆسکڵفت** (ئەردە.): پێست ئەستوور. بێ شەرم، بێ ئاڕوو.

**پۆسلکیان بە پێشەوە:** لەڕی، لاواز بوون.

**پۆسی** (هەورا.): پێست، پۆست، چەرم.

**پۆسیان** (ئەردە.): ڕزین، داڕزان، بۆگەن بوون.

**پۆسین:** پۆسیان، کەوڵپۆست، کەوڵ.

**پووش:** (باک.) پووار. پەلاش، پووش و پەلاش، گیای ووشک، پووشاڵ پلاش، خاشاڵ.

**پۆش:** بزنێکە کەپۆ و گوێیەکانی سپی سپی بێ بەلان سەر و لەشی ڕەشبێ. (باک.) نێوانی شاخی ئاژاڵان و وولاخانە، بپۆشاکەتن هەڤرا: شەرە شاخ کردن. شاخی ئاژاڵ و وولاخانە. پەردە. (ئەردە.) میچ، سەربان.

**پۆشاک:** جلک، بەرگ، جل و بەرگ. کالای لەبەرکردن. (باک.) ڕەقی. سپاڵ، پووشەن.

**پۆشاڵ** (ئەردە.): ڕیشووی چتمەکان.

**پووشاڵ** (ئەردە.): پووش، ریشۆل، گژوگیا.

**پۆشان:** پۆشین.

**پووشانە:** پارەیێکە ئاغا لە خاوەند ئاژاڵێکی دەستێنێ لە ساڵێدا بەرانبەر بەو پووشەی، کە ئاژاڵەکانی خوواردوویانە.

**پۆشاندن:** بێ پۆشین، پێ لەبەرکردن.

**پۆشانن** (ئەردە.): لەبەرکردن، پێ لەبەرکردن. شاردنەوە، پنامکردن، پەنهانکردن.

**پۆشە** (ئەردە.): سەربان، میچ.

**پۆشەر**: ئەو کەسەیە یا ئەو چتەیە چتی بپۆشێ، داپۆشەر. پەردە.

**پووشە سوورە** (دزە.): کەرخنکێنە، جوورە گیایەکە.

**پۆشەکەر** (باک.): قۆچەوان، شەرکەر بە قۆچان. بەنانێ ـــ ە: ئەو پیاوە ئازایە.

**پۆشەگا** (بل.): گیایەکی باریکە لە کورتان داخنرێ، گیای گەرمێنییە.

**پووشەلان**: جێگایەکە پووشی زۆر بێ.

**پۆشەمەنی**: پۆشتەمەنی.

**پووشەن** (شوا.): پێخەف.

**پۆشەن** (ئەردە.): پۆشاک.

**پۆشەنی**: پۆشتەمەنی، پۆشاک.

**پۆشتەمەنی**: پۆشەنی.

پووش بەقنگە

**پووش بەقنگە**: پەپوولەیەکی تلک درێژە چوار باڵی یەک لەسەر یەکتری هەیە.

**پووش برنج**: بەلم، پووشی برنجی پاککراو. باران بران.

**پووش پەر**: یەکەمین مانگی هاوینییە.

**پۆشت**: بۆ نێرینەی سووک بەکاردەبرێ، حیز، بلچ، کوونی، قووندەر.

**پۆشتە**: چەلەنگ، پەرداخ، کۆک، بۆشناخ. بەرگی ـــ: بەرگی کۆک. ـــ بوون: کۆک و بۆشناخ بوون.

**پۆشتەکردنەوە**: کۆک و پۆشتە و بۆشناخ کردنەوەی کەسێکی هەژار و رووت.

**پۆشتەمەنی**: جل و بەرگ.

**پۆشتە و پەرداخ**: کەسێکە زۆر پۆشتە و رێک و پێک بێ.

**پۆشتەیی**: کۆکی، بۆشناخی، پەرداخی.

**پوشتی**: حیزی بۆ نێرینەیە.

**پووشخورما**: پووشی خورما.

پۆشتەمەنی

**پووشدانەدەست**: مەبەس لەوەیە، کە یەکێکی نابووت بکەی، دەڵێن: پووشێکتدا بە دەستم واتا نابووتت کردم.

**پووشدیان**: پووشی ددان، ددان پاککەرەوە.

**پۆشران**: داپۆشران، لەبەر چاوان وونکران.

**پۆشراو**: داپۆشراو، وونکراو. تەپسکراو.

**پووشک** (باد.): پووشکە، گچکەکراوەوەی پووشە. (دەر.) پیفۆک.

**پووشکە**: لاسکی گیای ووشکە، پووش. پووشک. قووره. (باک.) پووت.

**پووشکووتن**: پشکوتن، پکشفتن.

**پووشل** (باک.): بێزوبۆ، نەفرەت. ـــ کرن: بێزوبۆ کردن.

**پووشلە** (ئەردە.): فتیلی لۆکەی پێچراوەوەی چەوورکراو، کە وەکوو شاف هەڵدەگیرێ.

**پۆشمان** (باک.): پەشیمان. (باک.) ـــ ی: پەشیمانی.

**پووشن** (ئەردە.): پۆشاک، سیپاڵ، پۆشەمەنی.

**پووشۆ**: نێوی نێرینانە.

**پووشوو**: لۆکەی کۆن و پەڕۆ کۆن لە ناوی کاڵەک وخۆڵەمێشیدا دەخوسێنن، کە ووشکبۆوە دەبێتە پووشوویکی زۆرباش. کشتەکی چەخماخی. قاوی ئەستێ و بەردی. (هەورا.) پیفوو، پیفێ، پیفک. کارگێکی ووشکی پفەڵە لە نێو دارە بەڕوو و دارگوێز پەیدا دەبێ و بە ئەستێ و بەرد دادەگیرسێ. چتێکی نەرمیشە لە گارگ و کەمکۆڵ پەیدا دەبێ ئەویش بە بەردە ئەستێ دادەگیرسێ لە پێش پەیدابوونی شخارتە هەر ئەو بەکار دەبرا. ـــ ی داری: قاوی دار.

**پووش و پەلاخ** (باک.): پووش و پەلاش.

**پووش و پەلاش**: پڕوپووش، پووش و پەلاخ، (هەورا.) پلوو پووش. هەژگ و هەژاڵ، پژگاڵ.

**پۆشی** (هەورا.): (کە.) پۆشین. پۆشینە. جوورە شەدەیەکی رەشی سادەیە. (باک.) پەردە. ـــ کردن: پۆشین، پەردەپۆشین.

**پووشی** (باد.): پووشوو، قاو، پیفۆ. پۆشی سەری ژنان، جوورە پارچەیێکی تەنکە.

**پووشیە** (فە.): پێچە، رووبەند، رووپۆش.

**پۆشیدە**: شارراوەوە، شاریاگەوە، پەنام، پەنهان، نهێنی.

**پۆشین**: لەبەرکردن، پۆشان. لخوەکرن، داکووڕین، پووسان. پۆشی رەشی ئاوریشمی ژنانەیە، هیزار، کە ژنە کرمانجان بەزۆری لە سەری دەبەستن. (موک.) شەدە و جوورە دەسماڵێکە. تەپسکردن، داپۆشین، وونکردنی دەنگ و باس تا بلاو نەبێتەوە، پەنام کردن.

**پۆشێن**: لەبەرکەر، پێپۆشین.

**پووشین**: پووشەلان، چتێکە لە پووش دروستکرابێ، پارچەیێکی ئاوریشمی ئەستوورە ژنان لە سەریان دەبەستن، پووشێن.

**پووشینە**: سەلە و سەوەتەی پووش.

**پووشینەو**: لەبەرکردنەوەی پۆشاک. داپۆشینەوە.

**پووشین پێچ**: جوورە خشڵێکی ژنانەیە لە پۆشینەکەیان دەپێچرێ.

**پۆغە**: گوێرەکەی نەخساو، پارگوێری نەخساو.

**پووف** (لو.): سیپەلاکی گیاندار.

**پۆف** (باک.): تووک، موو، پرچ.

**پۆقرە**: (فە.) سۆیەکە لە زیپکەی گەورەترە. (رەوا.) بلق. (هەو.) گۆیکە.

**پۆقزە**: زیپکەی ووردی ئاودار، پۆرگ.

**پۆقلە** (دزە.، رژژ.، دەر.): پۆرگ، بلۆق، تلۆق.

**پۆقیزە** (زا.): باوێژە، بی ئاوێژە.

**پۆک** (باد.): پەککوو. (هەورا.) پاک و خاوێن.

**پووک**: (شەم.، شکاک.) پوو، (باک.) پدی، (هەو.) پدوو، (هەورا.) هاروو، گۆشتی دەورووبەری ددانان. پووچ. چنگاروڵ. چەموڵە، پووکاووڵ، (ئەردە.) پەنجوولە. باو بارانێکی سارده. سێلاو، لافاو. (لو.) پووچ، پووت، پووتەڵ، هوڵۆڵ. (باک.) بەفری ووشک واتا ئاودار نەبی.

**پووکالا** (ئەردە.): چەموڵە.

**پووکانەوە**: پووچانەوە، پووچ بوونەوە، کەمبوونەوە و لەناوچوون، چرچ بوون، بچووکبوونەوەی چت.

**پووکاندنەوە**: پووچاندنەوە، پووچکردنەوە.

**پووكلو:** پووترکاو، گەنەڵ، گەندەڵ.

**پووكلووڵ:** چەمۆڵە، پووک، چنگاووڵ.

**پۆکە:** بڕوانە: پووکە.

**پووكە** (ئەردە.): پۆکە، نووکە، گریانی لەسەرەخۆ.

**پۆکەپۆک** (زا.): بەفری کەرەپوو. (جا.) نووکەنووک، سکاڵا و گلەیی لەبەرخۆوە، نەرمەگریان.

**پووکەپووک:** پۆکەپۆک.

**پۆکەر:** جۆرە قوماریکە بە قاقەز دەکرێ.

**پۆکەلاو** (هەورا.): چەمۆڵە.

**پووگ** (باد.): بای بەهێز، رەشەبا.

**پۆل** (رۆژ.): هێشووی ترێ و خورما و ئیتر. گرز و دەستەی لەشکر. پۆلی قوتابخانە. پۆلی باڵندان.

**پۆل:** ـــ ی قوتابخانان. تەشق. ـــ ی ناو دەکەوێ: تەشقی ناو دەشکێ. ـــ ی زەوی دەکەوێ: تەشقی زەوی دەکەوێ. کۆمەڵە و دەستەی باڵندانە. گەڵ، پیلک، گەبەڵ. (سوور.) پۆلوو، پەنگر. (زاخ.، دهۆ.) شان. (باک.) شەپیلکی شان.

**پوول:** دراوێکی مسینی کەم نرخە. پارچە قاقەزێکی چاپکراوی میرییە بە نامە و قۆچانەوە دەنرێ. (زا.) ئێسکی دەفەی شان.

**پووڵ:** ١) دراو، پارە، (هەورا.) زەڕ. دەراڤ، دراڤ، پۆلک، (باک.) پەرە. ـــ دروستکەر: کیمیاگەر. ـــ دروستکردن: کیمیاگەری. پیشەی ـــ دروستکردن: کیمیا. بێ ـــ: نابووت. ٢) پوولی چەپەرخانە: پوولی پۆستەخانە.

**پۆلا:** کانێکە وەکوو ئاسن بەڵام پتەو و سەختتر و نرخدارترە. تیغ و ئامرازی باشی لێ دروستدەکرێ. (باک.) جۆرە ماسییەکە. پۆلاد، فولاز، ماڵی(جان پۆلاد) ییە، جان بلاط بنەماڵەیێکی ناوداره چەند سەدەیێکی لە کوردستانی ژووری حەڵەبێ فەرمانڕەواییان کردووە، بەسەرهاتی وان لە مێژووی شەرەفخانی بەتلیسیدا دوور و درێژە ئەمڕۆ ئەو بنەماڵەیە دورزین و لە لوبنان دادەنیشن.

**پۆلاخۆر:** مرۆی ئازا و نەبەز، شێرکوژ.

**پۆلاد** (لو.): پۆلا.

**پۆلای باش:** (باک.) پەرەندار.

**پوولاک** (باک.): دوورگمە.

**پۆلان:** گێچەڵ، تەشقەڵە، رووت.

**پۆلانیا** (موک.): دەمەمزەرد، (دزە.) بەرەنیا. گاسنێکە یا مرازێکی تر نووکەکەی کول بووبێ پارچە پۆلایەکی چکۆڵەی دەخەنە سەری و تیژی دەکەنەوە.

**پۆلاو:** پۆلان.

**پۆلایین:** ئامرازێکە لە پۆلا دروست کرابێ.

**پوولە** (موک.): جۆرە ماسییەکە.

**پۆڵە** (فە.): پرد.

**پوولەزەرتکە:** جۆرە دراوێکی کەم نرخە لە زەرد دروست دەکرێ.

**پووڵەکە:** پارچە چەرمێکی گچکە و سێ سووچە لە ڕاست و چەپی کەوش دەدرێت. ـــ ی ماسیان: چتێکی گردی تەنکی رەقە بەسەر پشتی ماسیانەوە. ـــ ی تارای بووکان: چتێکی گردی زەردی تەنکی بچووکی تروسکەداری کۆتە بە تارای بووکان و کاڵای ژنانەوە دەدرێت.

**پووڵەکەرێژ:** پووڵەرازاوەوە.

**پووڵەکەماساو** (هەورا.): پووڵەکەی ماسی.

**پووڵەکی:** مرۆڤی ڕژدی لەچەری پارەپەرست.

**پووڵپەرست:** پارەپەرست، دراوپەرست.

**پۆلپۆل:** چین چین، دەستەدەستە. (باد.) بۆلبۆل، بلمەبلم.

**پووڵرەش:** فلس، فلووس.

**پۆڵک:** دووزمانی. ـــ چاندن: تێچاندن، دووزمانی کردن. ـــ کردن: پێکوڵ چاندن. (ئەردە.) پۆل، تیپی باڵندان.

**پوولک** (باک.): گچکەکراوەی (پوول)ە.

**پۆلک:** پۆلوو. (باک.) پارە، دراو، پووڵ، پووڵی دراو سپی.

**پووڵک** (ئەردە.): پووڵەکەی ژنانە. پووڵەکەی ماسیانە.

**پووڵکە** (ئەردە.): پووڵک.

**پۆلکە:** (هەو.) کەلی. شۆقل، قەلۆکە. گیایەکی خوار و خێچە گەڵایەکانی وەهی گەنم و جۆی دەچن، بەڵام کورتترە، لە چەند جێگایەکی گوڵی سووری چکۆڵە دەردەکات، کە وەری پۆلکەی لێپەیدادەبێ، کە ئەویش چەند جۆرێکن وەپاقلەی دەچن. ـــ خاتوونە. ـــ گاگۆژ. ـــ گایانە. ـــ مارانە.

**پۆلکەخاتوونە:** شۆقلێ خاتوونە.

**پۆلکەگاگۆز:** شوقلێگایانە.

**پۆلکەگایانە:** پۆلکەگاگۆز.

**پۆلکەمارانە:** شۆقلێمارانە.

**پۆلکنای** (هەورا.): پێوەنان.

**پۆلکێن** (شار.): دارێکە هێندە ووشک بووبێ پەلکیشی پێوە نەمابێ.

**پۆلوو:** (رەوا.) پەنگر، (خۆ.، زەن.، بابا.) پشکۆ، (هەورا.) سکڵ، سکەڵ. (دەر.) پشکووێ، (سوور.) پۆل. (دا.، زەن.، جەبا.) ئەسکڵ. پۆلک، پەل (باد.). (خۆ.) پۆیل. پەرەنگ، کۆز، (باک.) گوورزمە. تراد.

**پۆلی** (هەو.): تەشق.

**پوولی:** پۆلووی ئاوری، سکڵ، پەنگر.

**پۆلیە:** ڕیشووی زەنگیانەیە، کە پوولەکەی زێڕ و ئیتری پێوەدەکرێ. پۆیلە، پۆیلانە.

**پۆلیس:** هەیتە، شاگرددارۆغە.

**پۆلیسخانە:** هەیتەخانە.

**پووم** (باک.): باکردن، هەڵاّمسان.

**پوونە** (باد.): کەپەک.

**پۆنجین** (باک.): ڕامان، ئەندێشەکردن. بپۆنجە.

**پۆنژین** (باک.): خەوبردنەوە، وەنەوزە. بپۆنژە.

**پۆنگ:** (باک.) پنگ (نەعنا). (دەر.) پۆنگاو.

**پۆنگ**: ئەو ڕیز و قیت و بڵندەیە لەسەر گلۆڵەبەنان بە گرێز هەڵکرابێ و دواییە باری دەگۆڕن و بەلایەکی دیکەیدا بادەدەن.

**پونگاڵ** (باک.): نومێد، هەویا، هیوا. ناوچە، ئەنجومەن.

**پونگانەوە**: پەنگانەوە، پەنگخواردنەوەی ئاو.

**پۆنگاو**: ئاوێکە پەنگی خواردبێتەوە و دەرەتانی دەرچوونی نەبێ.

**پوونگە** (هەورا.): پنگ، گیایەکی بەهاری و ئاوی و بۆنخۆشە وەک نەعنا وایە.

**پونگەران** (ڕەوا.): پنگەڵان، جێگایەکی پنگی زۆر بێ.

**پونگەکێفیلە**: پنگە کێویلە.

**پۆنگ خواردنەوە**: پەنگخواردنەوەی ئاو و دووکەڵ لەبەر گیرانی پێشیان.

**پوویاگ** (ئەردە.): پرواو، تێکچوو، ڕزیو.

**پوویان** (ئەردە.): پروان، ڕزان.

**پوویچەڵ** (دەر.، ڕۆژ.): پووچ، پووچەڵ وەک: گوێز و بادام و ئیتر. مەرێکە کەمێک گچکە بێ.

**پوویز** (ڕۆژ.): پووز، بەلەک. لە نێوانی پێ و ئەژنۆیاندایە.

**پوویس** (باد.): کووزەڵە، جوورە گیایەکە.

**پۆیشی** (باد.): مێشوولە.

**پۆیل** (خۆ.): پۆلوو.

**پۆیلانە**: باربوو، باربووێکە، کە ڕۆژی دووەم ژنان بە بووکێیەوە دەبەن و یا بۆ ژنێکی دەبەن، کە منداڵی بووبێ. (خۆ.) پۆلیە.

**پۆیلە** (هەو.، هەورا.، زەن.): ڕیشووی زەنگیانەیە، کە پوولەکەی زێڕ و ئیتری بەسەرەوەیە بەسەری منداڵانیدا دەکەن. زڕ و زەنگیانەی سەری ژنانە. پارچە خشڵێکیشە، کە بەلا جانگیدا دەکرێ. پۆیلانە. (خۆ.) باروبوو، بەخشش. منداڵێک دوای بوونی، کە بیبەنە لای باوکی و خاڵی هەر چێتێکی کە بیدەنێ: ـــ ی پێدەڵێن.

**پووتی** (باک.): پەنوو، پووک.

**پووین** (باک.): دەباغکردن.

**پووینە** (هەورا.): پنگ. دارێکە سەرێکی لە ژێرەوە بە خوانکەی ئاشەوە دەبەسترێ و سەرەکەی تری لەدەرەوە دەبێ بەرداشی پێ بەرز و یا نزم دەکرێتەوە بۆ درشتی و ووردی ئارد، کە پێ بەرز بێ ئارد درشت دەبێ، کە پێ نزم بێ ئاردەکەی وورد دەبێ.

**پێ**: لاق، پا، پێچک، پاچک، چیق، پەی، قول، قاچ، (باد.) باق. بە. ـــ ی بڵێ: بەو بڵێ. ئەندازەی درێژی پێیەکی: فووت: ئەم ژوورە (١٠) پێ بەرین و ١٦ پێ درێژە. ڕاوەستان: بەپێوە تەماشایەکی کرد و ڕۆیشت. لا، کن: پارەم پێیە: پارەم لەلایە. بە، لا: پێم وایە: لام وایە، بەمن وایە. ڕۆژوو: پێیە: بەرۆژووە. لەلا، لەکن، وێ، جەم. پارەم ـــ یە: پارەم لەلایە، لەکنە، وێیە. توانا، ووزە، دەست ودوو. لە ـــ کەوتن: چەتربوون، لە دەست ودوکەوتن. ـــ لێنان: ددان پێدانان، درکاندن. ـــ لێ داگرتن: لەسەر ڕۆیین، (باک.) میچ لەسەرگرتن. بنارکردن، پەرس درێژکردن. ـــ لێ هەڵبڕین: دەستدرێژی، پێ لەبەر تێپەڕاندن. ـــ ی ئاشی. پەلەپیتکەی چەکانە.

**پیا**: پیاخ، ئاها، پیک، دەسا، (هەورا.) پیاو (لە پیاو، پیاگ) ی کورتکراوەتەوە. (خۆ.، دزە.) دابەزین، پیابوون.

**پیابردن**: چێتێک لەناو چێتێک ڕاکردن، چێتێک بەناو چێتێکدابردن، چەقاندن.

**پیابوون** (خۆ.، دز.): دابەزین.

**پیاپەریگ** (ئەردە.): دێوانە، شێت.

**پیاچەقان**: بروانە: پیاچەقین.

**پیاچەقاندن**: چەقاندنی چێتێک لە چێتێکی.

**پیاچەقین**: چەقینی چێتێک لە چێتێکیدا.

**پیاچزان**: چزانی شوێنێک لە ئەندام بە چێتێکی داغ.

**پیاچزاندن**: چزاندنی شوێنێک لە ئەندام بە چێتێکی داغ یا چزاندنی چێتێکی داغ بە لەشدا.

**پیاچوون**: سەرنجدان، لێووردبوونەوە. چوونی چێتێک بەناو چێتێکیدا، پێداڕۆیشتن. چەقان، چەقیان.

**پیاچوونەوە**: ووتنەوە و یا نووسینەوەی چێتێک لەبەر یا لەناو نووسراواندا. پێداڕۆیشتنەوە. پیا بچۆرەوە: پێیدا بچۆرەوە.

**پیاخ**: پیا، ئاها، پیک، هەیهەی، هەیهای. لەکاتی واق و وورمانێدا بەکاردەبرێت.

**پیادان**: پێدادان، چێتێک بە چێتێکیدا ماڵین. لێفە یا سەرپۆشێک بە کەسێک یا بە چێتێکی دادان. دزین، بردن.

**پیادە**: پاپیاگ، پەیادە، (باک.) پەیار، کەسێکە بەپێیان بڕوات. دژی سوارە. ـــ کردن: ژەهەقدانین. (ڕۆژ.) جوورە تفەنگێکی درێژە. گێل، نازیرەک: فیسارەکەس لە خوێندنێدا ـــ یە: نازیرەکە. مرازێکە لە کەرستەی گەمەی شەترنجێدا.

**پیادەڕا**: پیادەڕێ.

**پیادەڕێ**: باریکە ڕێگا، پیادەڕا، پیاڕێ. ـــ ی: کەناری شەقامان، شۆستە.

**پیادەکردن**: بەپێ ڕۆیشتن.

**پیادەی**: (باک.) پەیاداری. پیادە ڕەوی.

**پیادروون**: چێتێک بە چێتێکی دیکەدا دروون.

**پیار** (باک.): میهرەبان، بەزەییدار.

**پیاراگەیاندن**: پێڕاگەیاندن. دابەشکردن وگەیاندنی چێتێک بە چێتێکی تر بە کەم و کووڕیەوە: ئەوچێشت ونانە بەمیوانەکان ڕاگەیەنە، لە کاتێکا نانەکە کەم ومیوانەکان زۆرن. فریاخستنی بەشوێنێک یا بە کەسێکی بە چالاکی ئەم ئاوە بەناگرەکە ڕاگەیەنە و زوو بیکووژێنەوە، ئەم تۆشەیە بە کاروانەکە ڕاگەیەنە.

**پیارە**: زڕ. باوەپیارە: زڕباب.

**پیارزگ** (ڕۆژ.): بوخچە، پڕێسکە.

**پیاری** (باک.): میهرەبانی، دڵسۆزی، بەزەیی. پیادەڕێ.

**پیاز**: (هەو.، هەورا.، دەر.، فە.) پیواز، گیایەکی بە ناوبانگ ودیارە و سەلکداوە گەلاّیەکانیشی لوول ودرێژن، سەلکە پیواز.

**پیازاو**: پیوازاو، ئەشکەنە. گۆشتاوێکیشە، کە بەشی زۆری پیوازبێ.

**پیازە**: سووچ، تاوان. ـــ کردن، سووچ وتاوانکردن.

**پیازە خووگانە:** سەلکی گیای کاردو (هازە ناخوریّ). پیوازە کێویلە: گیایەکی کێوییە وە پیوازی دەچیّ، بەلاّم ناخوریّ، کەچی بەراز زۆری حەزلیّ دەکات. هەندێک زەوی، کە هەرێزدار و پیزڵداریّ و جووتێر نەتوانیّ بیکێڵیّ چەند سەلکێکی لەو پیوازەی یا چەند بێیەک لە زەوییەکەدا دەشارنەوە بەراز زەویەکەی هەڵدەدڕیّ و دەیکێڵیّ تا نەیدۆزێتەوە ڕاناوەستیّ.

**پیازەمارانە:** بۆ مارانە، سیرمۆکە.

**پیازپاکردن:** مەبەس لە ڕووپامایی کردنە بۆ یەکێکی.

**پیازتەڕە:** تەڕەپیواز.

**پیازکە** (هەورا): پڕێسکە.

**پیازۆکە:** گیایەکی کوێستانی و بەهارییە سەلکی وەکوو فیسقە پیوازی وایە گەڵاشی وەک کنێواڵ وایە، کە هەر لەناو شاخاندا دەڕویّ و دەشخوریّ.

**پیازی:** ڕەنگ پیوازی، چتێکە ڕەنگی وەکوو پیوازی وابیّ.

**پیاسە:** ڕاوێچکە.

**پیاسوین:** پیاسوون، پێداسوونەوە.

**پیاسوون:** چتێک لە چتێکی تر هەڵسوون.

**پیاف** (باک.): سەرخۆش. ئازا.

**پیافی** (باک.): سەرخۆشی، ئازایی.

**پیاکردن:** چتێک لە چتێکی دی هەڵکێشان، چتێک لە چتێکی تر نان.

**پیاکێشان:** چتێک بە چتێکی داماڵین.

**پیاگ:** پیاو. (ئەردە.) ـــ ەتی: پیاوێتی، مرۆڤایەتی، پێگەیشتوو، خۆناسین.

**پیاگەنین** (ئەردە.): پێڕاگەیشتن. ئازایی، جوامێری.

**پیاگەیاندن:** فریاخستن، پێڕاگەیاندن.

**پیاگەیشتن:** پیّ گەیشتن، فریاکەوتن.

**پیاگەیین:** پێگەیشتن، فریاکەوتن.

**پیاگخاس:** پیاو چاک.

**پیاگخووا:** پیاوی خودا.

**پیاگرتن:** چتێک بەڕووی چتێکی تردا گرتن.

**پیاگی:** پیاوەتی، مرۆڤایەتی.

**پیاگێڕان:** پێداگێڕان.

**پیال:** پیانە، (باک.) پەیال. پیاڵە.

**پیاڵ:** گێلاس. ژێر پیاڵە، ئاڵبەکی، بەرداغ، بادە، پەیانە، (باک.) بەرتیل. (هەورا.) ئیستیکان، ئیسکان.

پیانۆ

**پیام** (باک.): بادام. (ئەردە.) ڕاسپاردە.

**پیاماڵین:** پێداماڵین، پێداماڵینی چتێک بە چتێکی دیکەدا.

**پیان** (باک.): ئاوەخۆرە، قاپی ئاو خواردنەوە. پێیان، پیادەیی لە ڕۆیشتن. (ئەردە.) پاگەل. پێیان، لەلایان، لەکنیان.

**پیانان:** دانانی چتێک لەسەر چتێکی تر بە نهێم.

**پیانۆ:** پیانوو، ئەرغوون.

**پیانوو:** مرازێکە لە ئامرازەکانی مۆزیقە.

**پیانووسان:** پێدانووسان، لکانی چتێک بە چتێکی ترەوە.

**پیانووساندن:** پێدانووساندن، لکاندنی چتێک بە چتێکی تردا.

**پیاو:** مێر، مرۆ، مەرد، مەریتە، ئادەم، زەلام، مرۆی نێرینەیە. نا ـــ: نەمێر. ئاها، هاها، حا، پەحا. نۆکەر: ئازاد نۆکەری کوردستانییە.

**پیاوانە:** مەردانە، ئازایانە، مێرانە، ئادەمییانە، ئادەمانە. کردەوەی وەکوو پیاوان.

**پیاوەتی:** پیاوێتی، کە لە تەمەنی ١٨ ساڵیدابیّ. چاکە، مێرانی، ڕەندی، جوامێری، ئەرک، چاکە، خێر، جامێری، مەردایەتی. ـــ کردن: چاکە و جوامێری کردن.

**پیاوچاک:** جوامێر، مرۆی خوداپەرستی بیّ زیان. ـــ ی: جوامێری.

**پیاوخراو:** مرۆی بەزیانی دڵڕەق. ـــ ی: دڵڕەقی، زیانگەیاندن.

**پیاوفرۆش:** ئافرەتی زمانلووسی پڕ فڕوفێڵە.

**پیاوناس:** مرۆناس، زیرەک. ـــ ی: مرۆناسی، زیرەکی.

**پیاوی پیر:** پیرەمێرد، پیرەمێر.

**پیاوێتی:** پیاوەتی.

**پیاوێنی:** کاروباری پیاوانە. توواناى جووتبوونی لەگەڵ مێیینەی خۆی.

**پیاهاتن:** باسکردنی چتێک بە دوور و درێژی: بارام بە دوور و درێژی بە باسی ئازاد دا هات. هاتنی چتێک لە شوێنێکەوە: ئەو ڕێگایەی پێداهاتووم، ئەو جۆگەیەی ئاوی پێداهاتووە.

**پیاهاتنەوە:** پێداهاتنەوە.

**پیاهانین:** پێداهێنان.

**پیاهەڵپەڕین:** هەستان و بەگژ یەکێکی تردا چوون.

**پیاهەڵپەساردن:** پێداهەڵپەساردن، هەڵپەساردنی چتێک بە چتێکی تردا.

**پیا هەڵپژانن:** پێدا هەڵپژان.

**پیاهەڵتەقان:** پێداهەڵپەڕین.

**پیاهەڵتەقاندن:** پێداهەڵپەڕاندن.

**پیاهەڵتەقین:** پێداهەڵپەڕین.

**پیاهەڵچەقین:** تێهەڵچەقینی دڕک و داڵ یا بزمار.

**پیاهەڵچوون:** پێداهەڵچوون، پێهەڵگەڕانی گیاندار یا توولەی ڕووەکان بە چتێکی بەرزەوە.

**پیاهەڵخۆندن:** پێداهەڵخوێندن.

**پیاهەڵخووێندن:** بە تانی یەکێکیدا بە خراپ هاتنەخوار.

**پیاهەڵدان:** بەتانی یەکێکیدا هاتن بە چاکی.

**پیاهەڵڕووانین:** سەر بەرزکردنەوە و تەماشاکردنی چتێکی بەرز.

**پیاهەڵزنین:** پێهەڵگەڕان، پێداهەڵگەڕانی گیاندار بە چتێکیدا. تێوەپێچان، هەڵزەنین.

**پیاهەڵشاخان:** توورەبوون و بە گژداچوونەوە و قسەی ناخۆش ووتن بە یەکێکی و تەریقکردنەوەی، پێهەڵکاڵان.

**پیاهەڵشاخین:** پیاهەڵشاخان.

**پیاهەڵکاڵان:** پێهەڵکاڵان، پێهەڵشاخان.

**پیاهەڵکاڵین**: پێداهەڵشاخین.

**پیاهەڵگەڕان**: پێداهەڵگەڕان، پێداهەڵچوون.

**پیاهەڵگەڕاندن**: پێداهەڵگەڕاندن.

**پیاهەڵمیزان**: بەپێوە میز بە چتێکی بەرزدا کردن، پێداهەڵمیزتن.

**پیاهەڵمیزتن**: پێداهەڵمیزتن.

**پیاهەڵمیزین**: پێداهەڵمیزتن.

**پیاهەڵنان**: پێداهەڵپساردن.

**پیاهەڵوسین**: هەڵاوەسینی چتێک بە چتێکی بەرزدا.

**پیاهێنان**: پیاهانین، پێداهێنان.

**پێباخقە** (باک.): وەدووانی بخە، قسەی پێبکە. پێنەئاخقە: وەدووانی مەخە، قسەی پێمەکە.

**پێبار**: (؟).

**پێباز**: بەردەباز. ناوی ناوچەیێکیشە لە گوێی ڕووباری سیروان.

**پێبازە**: گیایەکە گەڵای وەک پێی باز وایە و چنگدارە.

**پێبازک** (باک.): پردەباز، بازگە.

**پێ بەتاڵ**: پێڵاوی گەورەی فراوان لە ژمارە بەدەر.

**پێ بەدارە**: ئێسکێکە بەدەم ڕان و قوڵی گیاندارەوە وەکوو چاکڵ وایە.

**پێ بەر**: وان، وانە، پارێزەر. ـــ کردن: پارێزەرکردن. ـــ ی: پارێزەری، پارێزگاری.

**پێ بەرێتی**: پارچە زەوی یا هەرێمێکە داگیرکرابێ.

**پێ بەقنگە**: گیانەوەرێکی ئاوییە پێی پەڕەدارە وەکوو مراوی وایە بەڵام بچووکترە.

**پێبەند**: پێوەند.

**پێبڕ** (باک.): نەرم، بێ مشوار، بێ فریشک.

**پێبڕان**: دووردکەوتنەوە، سەرلێنەدان وەپەرکەوتن، وەدەستکەوتن. بێ مشواری، بێ فرشکی.

**پێ بژیو**: ئازووخەیێکە، کە مرۆ پێ بژی.

**پێ بلقانێ** (هەو.): جوورە گەمەیێکی منداڵانەیە.

**پێ بلقە** (دزە.): نەردیوان.

**پێ بووبی** (ڕەوا.، زرا.): باوخۆن، باوەخۆن.

**پێبۆک**: (؟).

**پێبووکێ** (ڕەوا.): باوەخۆن.

**پێ بوون**: بەڕۆژبوون.

**پێ پانە**: دەستبلاوی، لەبەردان. واژی ئابۆری.

**پێپانە** (خۆ.): دەوروبەر، چوارکەنار.

**پێ پەتێ**: پێ خاووس، پێخووس.

**پێ پەجانێ**: پاپووچە. جوورە پێڵاوێکی منداڵانەیە.

**پێ پەست**: شێلان بە پێ. ـــ کردن: پەستاندنەوە. پاپەست، پاکوت، پێکوت.

**پێپەلاس** (باد.): پلیکانی خانووانە.

**پێ پەلووک** (باک.): بەردەباز، پێ پێ لۆکە، ئەو بەردانەن، کە مرۆ لە ناو ئاوێی دادەنێ تا بەسەریاندا بپەڕنەوە.

**پێپەیژە** (قەرە.): نەردیوان.

**پێپک** (باک.): پێچکی موبیلیایە.

**پێ پلەکان** (بالک.): نەردیوان.

**پێپلیکانە**: پێ پیلکە.

**پێ پۆش**: پاپۆش.

**پێ پۆک** (باک.): کوڵو، کولوو، کلوو، تونگە، کریستال.

**پێ پێچ**: پاپێچ.

**پێ پێچە** (شا.): تووریێن، (هەورا.) تۆشەبەرە. توورەکەیێکی پەڕێیە شوواناان نانی تێدا دەبەنە دەرەوە.

**پێ پیلکانە**: بڕوانە: پێپلیکانە.

**پێپیلکە**: پلیکانی لە بەرد و قوڕ و یا خشت و گێچ و قوڕ. نەردیوان.

**پێ پێ یانێ** (هەو.): هەنگڵمشەلە (گەمەیەکە).

**پێ پێوەنان**: داخستن، دەرکە ـــ. ڕۆیشتن بە گورجی. بەسەرەوەنان.

**پێت** (باک.): پێل، ئاگر و هاڵاوی ئاگری، ڕووناکی ئاگر، گڕی ئاووری، بڵێسەی ئاووری.

**پیت**: خێر و بەرەکەت، فەڕ. تیپ. کەللەسەر.

**پێتاو**: پارچە تەنراوێکە لە پێوە دەپێچرێ و کاڵەشی لەسەرەوە لەپێدەکرێ. بەلەک پێچ، پاتاو. پەڕۆکۆن و نیسترە لەجیاتی گۆرەوی لەلاقیان دەپێچن ئەوسا کاڵەی لەپێدەکەن. کاڵە و پێتاو.

**پێتاوە** (ئەردە.): پێتاو.

**پێتەتە** (شار.): مرازێکی جۆڵاییە لەناو پێچاڵدا جۆلا پێی لێدەنێ و بەرز و نزمی دەکاتەوە.

**پێتەر**: لەپێشوودا نێوی خولای هەرە گەورەترین بووە. پاتێر.

**پێتەک** (هەورا.): کەل و پەلێکە لەگەڵ بووکێ بۆ ماڵی زاوا دەنێردرێ، جیاز. کەل وپەلێکە کە لەگەڵ مرۆی بێ.

**پێتر** (جز.، بۆتا.): پتر، زیادتر.

**پێتک** (ئەردە.): جیازی بووکان. کووخێکە بە چرپی و پووشوو پەلاشی دروستکەن. (باک.) شەمچە، لێخڕینە، شخارتە.

**پێتگ**: داری شۆڕەبی.

**پێتمار** (باک.): بەپەلە، بەتاڵووکە، پیشرەس.

**پیتووکە**: پیتووگە.

**پیتووگە**: گیایەکە دەکرێت بە گزە بۆ ئاژالان بۆنی خۆشە و گوڵێکی سپی هەیە.

**پێتێ** (باک.): بڵێسەی ئاووری.

**پێتی** (باک.): ئاگر و هاڵاوەکەیەتی.

**پێجامە**: پۆشاکێکە وەکوو چاکەت و پانتۆڵ وایە، بەڵام بێ بەرە لەکاتی نووستنێدا لەبەردەکرێ.

**پێجێ** (ڕۆژ.): کاتێکی کەم، جێگایەکی کەم هێندەی جێ پێیەکی: لە ـــ یەکیدا هەزار درۆی کرد.

**پێچ:** مێزەری چیت و شەدە، پوورتک، کم، کەچەک، تیلار، مۆمی، کەڤن، مۆمینی، سەر و کۆفی. بورغی، برغی، مەنگەنە، جەڕ. (ڕەوا.) گەڕ، خول، سووڕان، لوول. جارە سووڕانێکی داوەتە. ــ یکی هەڵدەپەڕم: گەڕێکی هەڵدەپەڕم. ــ خواردن: (باک.) پەڕیتین. ــ دان: پەرپیتاندن. (فە.) ژان، ئێش. چەوتی، خواری، ناڕاست، چەوت. ــ ی ڕێگایان، لۆفە. سووچ و خوارایی کووچە و کۆڵانان. لاولاوەی دەرک و پەنجەران. (بابا.) ــ دان: بادان.

**پێچاڤ** (باک.): نێوچاوان.

**پێچاڤک** (باک.): کاسەی چاو، قووڵایی چاو، کالانی چاو.

**پێچاڵ:** (کە.) پاچاڵ. چاڵی جۆڵایە، چاڵی ئاسنگەرە.

**پێچان:** تێ ئاڵانی چتێک لە چتێکی تر. تێوەپێچان، پەریتاندن، لێ پێچان: تێ پێچان، تێ ئاڵاندن. هەڵپێچانی کەسێک، تەنگاوکردنی.

**پێچانە:** بڕوانە: پێچان.

**پێچانەوە:** تاپان، لوولدان. تێکەوەپێچان، قەدکردن. کردنە بوخچە. لێ ــ : تۆژانەوە، وەشووێنکەوتن، وەپەسێ و شووێنکەوتن. شاردنەوەی نهێنییەک لە یەکێکی تر.

**پێچاندن:** تێ ئاڵاندنی چتێک لە چتێکی تر.

**پێچاندنەوە:** پێچانەوە.

**پێچانن:** پێچاندن.

**پێچاوپێچ:** پێچ پێچ.

**پێچە:** ڕووبەند، ڕووپۆش، سەرووکە، خاڤک، پەچە، ڕووبەند.

**پێچەبەدەورە:** گەڕ، خول. خولخواردن، گەڕخواردن.

**پێچەک** (شا.): پارچە دارێکە هێندەی بستێکییە گوریسی پێ پێچ دەدەن تا بارەکە توندبێ چتێکە، کە چتی تری پێ بپێچرێتەوە. گلۆڵەی بەن یا ئاوریشمییە. (باک.) پارچە پەڕۆی کۆن، پرزۆڵە، زیواڵ. بەند، نەوار.

**پێچەکلۆ:** پێچ وکولۆ، بەفرێکە بە کولووی گەورە بباری.

**پێچەکڵوو:** پێچەکولوو، بەفرێکە بەکولووی گەورە بباری. لۆکەیەکی کراوەوەیە، کە پارچەپارچە کرابێ بە درێژکۆڵەیی (دەستپێچ) بۆ ئەوەی کە بەخەرەک بڕێسرێ.

**پێچەڵپاچ:** گوفتار یا کردار و یان چتێکی ناڕێک و نالەبارە.

**پێچەڵپێچ:** پێچەڵپاچ.

**پێچەک** (کۆ.): خەسورلە. (موک.) ڕاپێچان، پێچانەوەی دەوار بە دوو بەش بۆ بارکردنی. ئێشک. دارێکە ڕەسی لەسەر هەڵدەکرێ.

**پێچەن:** چۆڵە پێچەن، دارێکی درێژ و ئەستوورە بەقەد کلکە بێڵێکی پەتێکی لەنێوەڕاستی دەخرێ ئەو سەری پەتەکە بەستراوە بە چەپەری دەرکی ئاژاڵانەوە، دارەکە لە پشت دەرگایەکەوە با دەدرێ تا توند دەبێ وەپشت دەرگایەکە دەدرێت تا نەکرێتەوە.

**پێچەنە** (هەورا.): دەستڕازە.

**پێچەوانە:** چەپەوانە، ئاوەژوو، واژی، بەرواژی. چتی پاش و پێش.

**پێچ بادەر:** بادەک.

پێچ بادەر

**پێچ پیادان:** پێچ دان، خولخواردن، مەبەس لە دەرباز بوون و خۆ ونکردنە: ئازاد لێرە بوو هێندەی پێنەچوو پێچێکی خوارد و دەرچوو، سووڕخواردن.

**پێچ پیاهاتن:** پیچ پێداهاتنی ناوزگ، جوولانێکی پڕ پێچ و ژانی ناوزگە.

**پێچ پێچ:** خووار و خێچ، قەمچ قەمچ، پێچ و قەمچ.

**پێچ پێچۆکە:** چتێکە پێچی زۆر تێکەوتبێ.

**پێچخوواردن:** خولخواردن، خولانەوە، سووڕان، سووڕیان، (دەر.) چەرخانەوە، لوولبوون، با خواردنی چتێکی درێژ لە خۆیەوە.

**پێچدان:** لوولکردن و بادانی چتێک. پێچان.

**پێچرا:** چرادان، چتێک بووە چرای لەسەر دادەنرا.
خولی خوارد، بادرا، بەسترا.

**پێچران:** خولخواردن، بەستران، پێچ خواردن، تێک ئاڵان.

**پێچرانەوە:** بەسترانەوە، خولخواردنەوە.

**پێچراو:** خولدراو، پێچدراو، بەستراو، چلووچووڤ.

**پێچراوەوە:** داپێچراوەوە، پێچدراو، کۆکراوەوە. ــ ی: داپێچراوەوەی، پێچدراوی، کۆکراوەوەی.

**پێچڤان:** وەرگێڕ. ــ ی: وەرگێڕان.

**پێچک:** پێچکە. گولۆڵە. ڤرڤرە. پێچ، چەرخ، دۆڵ، تەگەرە. لاق و لەتەن، پاچک، پاچکە.

پێچکە

**پێچکە:** پێچک و تایەی عەرەبانە و ئوتومبیل و ئیترە. پێچکی کورسی و مێز و ئیترە، خرتک، دەست و پێی ئاژاڵی وردە. ئاسنە درێژەکەی ئەولاو لای لغاوییە.

**پێچکردنەوە:** لە ڕێڕەو لادان بەلای چەپ یا بەلای ڕاستدا.

**پێچڵە** (باک.): سەندەڵ، پاپووج، جوورە پێلاوێکە.

پێچڵە

**پێچ لەخۆدان:** خۆپێچدان، پێچخواردن.

**پێچ لێدان:** پێچ لە ئاسندان وەکوو بورغی. خووار و چەوت ڕۆیشتن، لادان. یاخی بوون، بێ گووێ پێکردن. ــ بزێوی کردن. فێڵکردن و قوماربازی.

**پێچن:** پووچن.

**پێچووانەن:** وێچوواندن.

**پێچ و پەنا:** شووێنی ناڕێکی پڕ کون و کەلێن، کون و کەلێن، کون و قوژبن. فروفێڵ، فرتوفێل. بە ــ : فێڵباز، کەڵەکباز.

**پێچ و پلووچ:** شووێنێکە یا چتێکە کەناری ڕێک بێ و پێچی زۆر تێدابێ. خووار و خێچ.

**پێچ و تاو:** ئازار، ڕەنج. ــ دان: ئازارکردن.

**پێچۆک** (باک.): پاکەت، بەستە، ڕژتە.

**پێچووکە** (سەرد.): سێ چووکڵە.

**پێچووڤە** (شار.): پیچۆک، گیایەکە. (سور.) جووتە کەزی پێش نێوچاوانیە. جووتە کەزی بەرجێنووکێ لاجانگ. پەرچەم.

**پێچوکلۆ:** بەفرێکە بە کولووی گەورە بباری. پێچەکلۆ.

**پێچۆلەکە:** گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک کەرەوز وایە گوڵێکی زەردی پچووک دەگرێ.

**پێچ و مۆرە:** بورغی، جەر.

**پێچوون:** ڕێچوون، لێکردن. تێدامانەوە؛ ئازاد لە چاپی ئەو پەرتووکەدا زۆری پێچوو. تێداچوون، لەناوچوون، پێمردن. تەریق و شەرمەزاربوونەوە.

**پێچی** (باک.): قامکی پێیانە.

**پێچیاگ:** پێچراو، لوولەبووگ، شێویاگ.

**پێچیان:** لوولبوون، شێوان. بادانی چتێک، پێچران، مەبەس لە پێچدانە.

**پێچیانەوە:** هەڵپێچران، لوولەبوون.

**پێچیان بەیەکا:** بەیەکەوە بەسترانەوە.

**پێچی ڕێگا:** بادانەوەی ڕێگا.

**پێچی سەر:** سەرپێچ.

**پیخ:** ڕیپۆقی چاو.

**پێخاری** (هەورا.): پێخۆر.

**پێخاس:** پێخوواس. ئاوارە، هەرزەگەرد.

**پێخام:** وەڵام.

**پێخامبەر:** پێغەمبەر، پێخەمبەر، پەیامبەر.

**پێخامبەرایەتی:** پێغەمبەری، پەیامبەری.

**پێخامبەری:** بڕوانە: پێخامبەرایەتی.

**پێخاووس:** پێخوواس، پاپەتی، بێ پێڵاو.

**پێخاووس:** پێخوواس.

**پێخەسوو** (ڕۆژ.، جاف.): بەربووک.

**پێخەف:** نووێن، شەوێس، سەرەخەر.

**پێخەم:** پێخام.

**پێخەمبەر:** کەسێکە لە لایەن خوداوە ڕاسپێردرابێ، کە ئامۆژگاری خەڵکی بکات بۆ ئەوەی قسەی باش و کاری باش و بیری باش بکەنە ڕێبازی ژیانیان. ــ ایەتی: پێخامبەرایەتی.

**پێخەنین:** پێکەنین.

**پێخستن:** پەککەوتن لەڕێ ڕۆینا لەبەر ماندوێتی.

**پێخوواردن:** بڕوانە: پێخووارن.

**پێخووارن** (باک.): پێخۆر، خۆرش.

**پێخوواس:** پێخاورس، (باک.) پێخاس. پاپەتی، پاووریایی. ئاوارە، هەرزەگەرد. وولاخی بێ ناڵ یا سوواو.

**پێخۆر:** پێخووارن، خۆرشت. (هەورا.) پێخارن. چتێکە بە نانەوە بخورێ.

**پێخورین:** شانازی کردن، پشت پێبەستن.

**پێخوست:** شووێن پێ، پێشووێن. پێ پەست، چتێکە بکەوێتە ژێر پێمانەوە، شووێنێکە، کە زۆر بەسەریدا هاتوچۆ کرابێ.

**پێخۆشبوون:** کەیفخۆش و شادبوون، دڵخۆشی. بەشکست و زیانی دوژمنان کەیف هاتن.

**پێخۆشکردن:** دۆست یا نەیاران بەخۆ خۆشکردن. دڵخۆشکردن.

**پێخولە:** منداڵی پێرەوکە.

**پێخووێ:** کۆمەڵێک لە قوڕی گیراوەوە. خەرمانێکە گێرەکرابێ و شەن نەکرابێ.

**پێخێر:** ناڕێک، ناپوخت، شێواو.

**پێدا** (باک.): پەیدا.

**پیداچوون:** درێژەپێدان، لەسەر ڕۆیشتن. پێ هەڵچوون. بەوێدا تێپەڕین.

**پێداچوونەوە:** دووبارە درێژەپێدان، دووبارە لەسەر ڕۆیشتن. دووپاتکردنەوەی چتی نووسراوەوە، خوێندراو. دیسان بەو شووێنەدا ڕابردنەوە.

**پێداخوڕان** (ڕۆژ.): شانازی.

**پێدادان:** گەیشتنە مەبەس و ئارەزوو. دەستپێکردنەوە. هێرش بردنەسەر. بە لێفە یا جاجم و ئیتر داپۆشین.

**پێدار** (باک.): بەستراو، هەڵاواسراو، داپۆشین. قابقاب، کەوشەدارینە.

**پێدارە:** ئێسکێکە بەدەم قۆڵ و ڕانی گیاندارەوە وەکوو چاگڵە: چەڵەمە، چۆلەمێشکێنە.

**پێدارک** (باک.): پێدار.

**پێداری** (باک.): گوریس. میرێتی، خونکاری. ــ کرن: میرێتی و خونکارکردن.

**پێدافسان:** فیسکان.

**پێدافساند:** فیسکاندن.

**پێدافسین:** فیسکین.

**پێداڤ** (باک.): تەڵەی گورگی.

**پێداکێشان:** پێدادان، شەقلێدان، پێداماڵین. تێڕاکردن.

**پێداکردن:** ڕێخستن، پێداهەڵاوەسین.

**پێداگرتن:** چتێک بەسەر چتێکیدا کردن و داپۆشین. هەتە، لەسەر ڕۆیشتن، میچ لەسەرگرتن. پرس درێژکرن، چیرە درێژکردن. بنارکردن، پێدانووسان.

**پێداماڵین:** پێدادان، پێداکێشان، پێداهێنان.

**پێدان:** دان، دانی چتێک بە کەسێکی.

**پێدانان:** تووشی زیانکردن، پێبژاردن.

**پێدانووسان:** پێداگرتن.

**پێداویست:** پێویست، ئاتاج، هەژار، دەستکورت، ئاوسەرکەم، زووگوور. ــ ی: کەماسایی، هەژاری، دەستکورتی، ئاوسەرکەمی، زووگووری.

**پێداهاتن:** بەسەرداهاتن، تووشبوون. لەسەرەتاوە دەستپێکردن تا دوایی. وێڕاهاتن، بەڵەدبوون.

**پێداهێنان:** پێداماڵین، چتێک بە چتێک داهێنان. سام، ساف.

**پێدە** (باک.): پەیدەرپەی، بێ پسانەوە. ژسبەهێ پێدە: لە بەیانییەوە.

**پێدەش:** داوێنی خووارەوەی کێوان، دەشتایی. ئاستێکی ڕاست و تەختە لە داوێنی کەژ و کێواندا.

**پێدەکەر** (باک.): سفرە.

**پێدزە:** خۆدزینەوە، پێدزکێ.

**پێدزکێ:** هەنگاو کورتکردنەوە و خۆدوواخستن. پەشیمانی، ژیوانی.

**پێڕ** (بابا.): دەستە، کۆمەڵە، تاخم.

**پێر** (باک.): پێرێ.

**پێرار**: دووساڵ لەمەوپێش.

**پێرارەکە**: پێرار.

**پێراگەیاندن**: وەڵامدان، ئاگادارکردن.

**پێراگەیشتن**: پێگەیشتن (بۆ میوە). بۆ ئاوات و یا دەرفەت گەیشتن. لێ پرسینەوە، پشکنین، بەسەرکردنەوە.

**پێراگەیێن**: ڕاگەیێن، ئاگادەر، وەڵامدەر، وەڵام هێنەر، باخێر.

**پێراگەیین**: پێراگەیشتن.

**پێراموس**: زمانلووس، چاپلووسیکار. ـــ ی: زمانلووسی، کلکە سووتە.

**پێران** (ئەردە.): وەناق. فەرقان، تاس، گەروەخرە.

**پێرانان**: ڕایەڵکردنی دار یا ئاسن بەسەر دیواراندا یا جۆگە و چۆماندا بۆ پرد.

**پێراندن**: پیشاندن، پرماندن، فراندن، دەنگ لە کەپۆی وڵاخی بەرزەوە هاتن.

**پێراهاتن**: سلاربوونەوە، کەوتن، بەلاداهاتن، بەلاداکەوتن، مردن، منداربوون.

**پێراهێنان**: پێراهاتن، سلاربوونەوە. ڕایەڵکردن. خەت پێدا کێشان.

**پێرایە** (باجە.): دووسبەی.

**پیرە**: بۆ ئافەرین لێکردن بەکاردێت: پیرە ! هەڵوێستێکی دیارت هەبوو.

**پێرەشەو**: پێرێ شەوێ.

**پێرەکە**: پێرێ.

**پێرەنج** (باک.): برینی پێ.

**پێرەو** (باک.): لاگیر، لاگر. ڕێککەوتوو، یەکگرتوو، وەدووکەوتوو.

**پێرەوکە**: منداڵێکە تازە پێی هەڵگرتبێ، منداڵێکە تازە کەوتبێتە سەرپێیان.

**پێرەوکەڵە**: پێرۆکەڵە، منداڵێکە تازە پێی هەڵگرتبێ.

**پێرەو**: یاسا و بەرنامەی ڕێباز.

**پێرەوی**: لاگیری، لاگری. وەدووکەوتن، یەکێتی.

**پێربوونەوە** (باک.): گیایەکە.

**پێرپێداهاتن**: بەهەندگرتن. خۆکردنە خزم.

**پێرز** (لو.): پارێز.

**پێرس**: کێوێکی بەرزە لە نێوانی ئاکرێ و گوندی بلێدا لە هەرێمی بادیناندا.

**پێرست**: فەهرەست.

**پێرک**: هەرزاڵ، ئەستێرک.

**پێرگی** (باک.): پەرگی.

**پێرگین** (باک.): پەرگین، تووشی یەکتری بوون، یەکتر دیتن.

**پێرۆ**: باریەر، وڵاخ.

**پێروو** (هەو.، بار.): کۆ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. چتێکە وەکوو قالۆچەی باڵدار لە چاوی وڵاخان دەدا، ئەم ئازارە بە دژی ترش چارەدەکرێ.

**پێرووت**: لاق ڕووت. هەژار، ڕووت.

**پێرووژە** (باک.) : پیرۆزە.

**پێرۆکەڵە**: منداڵێکە تازە پێی هەڵگرتبێ.

**پێرێ**: دوو ڕۆژ لەوەپێش، (باک.) پێر، (هەورا.) پەرێ.

**پێرێ شەوێ**: (باک.) شەڤتر، دووشەو لەوەپێش.

**پێز** (باک.): ئاژاڵ، مەڕ و بزن. (سۆر.) پیست کێش، کەش، ڕا، کشانی هەویر. ئەم هەویرە بەپێزە. هێز، تین، زەبر. بە ـــ : پڕ پێز، (هەورا.) بەپیت. بێ ـــ : بێ پیت.

**پێزان**: ئاگادار، لێزان، شارەزا. سوپاسگوزار، ئەمەگدار، پاپا.

**پێزانادن**: ئاگاکردن، ئاگاکردن، سوپاسگوزارکردن، ئەمەگدارکردن.

**پێزانین**: ئاگاداربوون، ئاگاداری، زانینی چتێکی نهێنی و شاردراوەوە. سوپاسگوزاری، ئەمەگداری، لەبەرچاوبوونی چاکەی یەکێک.

**پێزە** (ئەردە.): کەمێک لە چتێک. گەوهەری یەگانە، گەوهەری یەکدانە، گەوهەری تاک. تۆز، نەخت، کەم.

**پێزووکۆدەمی** (هەورا.): پێزووکەی دم.

**پێژ**: داڕێژ: خشت پێژ. برژێن: نان پێژ.

**پێژان**: پیژتن.

**پێژاندن**: پێژاندن.

**پێژاندن** (ئەردە.): لێدان (خشت).

**پێژە**: ووتە، واژە، ووشە.

**پێژەک**: لە ئەندازە بەدەر. خونچەی گوڵ و گیا.

**پێژتن**: دابێژتن. (موک.) دەوەکردن. (زێ.) نانکردن.

**پێژک**: لکە ڕەزی بڕاوی ووشک.

**پێژن** (باک.): بەژن. دەنگدانەوە. تەقە. ـــ ا کرن: دیتن، ڕووانین. هەست، هۆش.

**پێژنا** (باک.): لەپێشدا، باسکراو.

**پێس** (ئەردە.): پێست. گوڵ.

**پێسە**: پێست، پۆست، چەرم. (هەورا.) وا، ئاوا، وەها.

**پیسەبەرخ**: پێستی بەرخ.

**پێسەڕێوی**: کەوڵی ڕێوی.

**پێسەن** (هەورا.): وایە.

**پێسەنگوور**: تڵف، تڵتەی ترێ.

**پیسەنیا** (هەورا.): وانییە؟

**پێست**: پۆس، پۆسە، (باک.) ئەیار. ئاڤار، گووێن، پۆست، چەرم، وڵک، لۆنگ، کەوڵ. ـــ لێکرانەوە: جڤلین، کەوڵکران. ـــ لێکردنەوە: کەوڵکردن، چەلتاندن.

**پێست**: پێستی گیراوەی گیاندار.

**پێستەخۆر**: مردەخۆر، حەرام خۆر.

**پێستەنە** (هەورا.): دەق، دەقاودەق، هەروەکوو.

**پێستر** (باد.): پلیکانی خانووان.

**پێسترک** (بارزا.): ئەردیوان، پێ پیلکە، پلیکان. (باد.) پەنجەرە.

**پێمتی خاراو:** پێستی خۆشکراو، سەختیان.

**پێمتی خاو:** پێستی خۆشنەکراو.

**پێمتخۆشکەر:** چەرم چی، دەباغ.

**پێمتی خۆشکراو:** پێست خاراو.

**پێمتی خۆشنەکراو:** پێستی خاو.

**پێموو** (بڵ.): کۆسپە و بڵندایی پێش دەرگە، ساهی داری چووار چێوە یا ئی هەر چتێکی تر بێ، ئاستانە.

**پێمۆر** (هەورا.): پێ لەسۆڵ. تەنگاو. ــ کردن: پێ لەسۆڵکردن، تەنگاوکردن.

**پێموور:** زنجیرەی کێوانە.

**پێمۆنە** (هەورا.): وەکوو.

**پێمی برک** (باک.): نەردیوان. پێوانەی نەخشە.

**پێمیر** (باک.): گیرفانی بەر باخەڵ. ئێخە و بەرۆک، ئێخەی دەرەوەی مل، مەمک، سینگ. ــ هەڵکێشاندن: هەڵبژاردن، دەستنیشانکردن. سەختی، تەنگانە.

**پێمرە:** قۆرە، پەرسیلە، پەسیرە.

**پێمقک:** زرنگ، زیرەک، پێ سووک.

**پێمقکی:** زرنگی، زیرەکی، پێ سووکی.

**پێش:** بەر، بەرێ، بەروو، وەرج، دەڤ، بەردەم. بۆ ــ: بەروونکار، هەمبەر، هەنتەش. وە ــ کەوتن: چوونە پێشەوە، پێشڤەچوون. پێش ئانین: هێنانەپێش. ــ چاڤی...کرن: ئێشاندن. ــ دە: لەپێشدا، بەرێ. ــ دەرکە: بەردەرگا، دەڤێ دەر. ــ دەم: بەردەم، نووا. ــ ڤەچوون: پێشکەوتن. ــ گرتن: بەرگرتن. کاتی ڕابردوو، سەردەمی تێپەڕیو. لەپێشدا: دبەردە، ژبەر، ژپێشڤە. ــ نیوەڕۆ: بەری نیرۆ. (باک.) نەخۆشی: ئەڤ چ ئێش و پێشن. (باد.) بات، جیات، بری. ژ ــ: لەجیاتی. سەرکەوتوو لە قوماردا. نیشاندان، ئاشکراکردن. ئێکو پەسند ناکەی بەرەخوە بدە پێش واتا ڕووی خۆت ئاشکرابکە.

**پێشان:** لەپێشدا، پێشدە، بەرواری ڕابردوو، لەبەراییدا. پێکشان، مارەیی لێکهاتن، لێک دروستبوون، بۆ هاوسەری یەکتری ڕەوابوون.

**پێشاندان:** نیشاندان.

**پێشانگ** (ئەردە.): پێشەنگ.

**پێشانگا:** پێشنگە، بەنگەه.

**پێشانگە:** بڕوانە: پێشانگا.

**پێشانگی:** نێوچاوان.

**پێشانی** (جا.): نێوچاوان. (فە.) سبەینێ، بەیانی زوو.

**پێشاو:** ئاڤدەستخانە، ئاودەستخانە، ئاڤرێژ، ئاڤرێژن، ئاودەست. ــ کردن: دەست بە ئاو گەیاندن، میزکردن.

**پێشاوەڵە:** بەراوەڵە، بەربەرەڵا، بەرەوەدە.

**پێشایی:** لای پێشێ، بەرایێ، سەرانگایی، (باک.) براهک.

**پێشە** (زەن.، هەورا.، جا.، ڕۆژ.): ئێسک. لای پێشەوەی لەشی گیان لەبەران. پێشەڵ، نیاوە. چەقاڵە، ناووک، ناوکی ڕەقی میوەیە. ناوکە، جنجک. (ئەردە.) ئێسک، سقان، پلان. کار، فەرمان، ئیش.

**پێشەخۆرە** (ئەردە.): هوما.

**پێشەسەر:** لای پێشەوەی سەری. جوورە خشڵێکی زێڕ یا زێوە ژنان بە پێشە سەریانیدا دەکەن بە قولاپی. (کۆ.) پێشچاوکە.

**پێشەشان:** بێڵەکان، پیشکێکە سەرەکەی ئاسن بێ.

**پێشەکی:** پێشین، دەستپێشین، ووتن و یا کردن یا دانی پارە لەپێش کاتی خۆیدا.

**پێشەڵ:** لای پێشەوەی مرۆ لە نێوقەدی بەرەو ژێرەوە، داوێنی لای پێشەوە. پێشە.

**پێشەم:** گرنگ، پۆتەکە، بەرکەتی. (باک.) پێنجشەمە.

**پێشەنگ:** بارگینێکی جووان و بەتین و قەڵافەتدار دەڕازێننەوە بە گوڵینگی جووان و ڕەنگاوڕەنگ و زەنگوڵان و هەمیشە لەپێشەوەی قەتاری دەڕوات. هەر چتێکیش لەپێشەوە بڕوا ــ ی پێدەڵێن و یا لەپێشەوەبێ. سەرەتا.

**پێشەنگی سوپای کوردستان:** پێشڕەوی لەشکری کوردستان.

**پێشەنی** (باک.): نێو چاوان.

**پێشەوا:** ڕابەر، ڕێبەر، پێشبەر. کەسێکە، کە بەرنوێژ (امام) بێ. ــ یی: ڕابەری.

**پێشەوە:** بەرەوە، (هەورا.) وەڵێنە. لە ــ: لەبەرەوە، لەسەرەتاوە.

**پێشبار:** باری پێشەوە، سووکە بارێکە ببرێتە شوێنێ تازە و هەوارگە. ــ ی قیامەت: پێشباری پەسڵان.

**پێشبەر:** ڕابەر، پێشەوا، ڕاغا.

**پێشبەرەڵا:** بەراوەڵە، بەربەرەڵا. ــ یی: بەراوەڵەیی، بەربەرەڵایی. *

**پێشبەری:** ڕابەری، پێشەوایی، ڕاغایی. ــ هەڤ: ڕووبەڕوو.

**پێش بەست:** بەرهەڵستێکە لەبەردەمی ئاوێدا دروست بکرێت، بەریان. ــ ی: بەرهەڵستی لە بەردەم ئاودا.

**پێشبەستن:** بەرهەڵستن لە بەردەم ئاودا. بەربەستن.

**پێش بەن:** پێشبەند. دەست بەندی.

**پێش بەند:** زنجیرێکە پەلی پێشەوەی وڵاخی پێدەبەسترێتەوە.

**پێش بین:** دووربین، پێشنیاز زان. پێش زان، پێشگۆ. ــ ی: دووربینی، پێشنیاز زانی، پسپیری، یەدەگ، پێش زانی، پێشگۆیی، پێشگۆتن.

**پێش پێش:** هەرە پێش.

**پێشتەرکی:** جوورە فیشەکدانێکە بەسەر قەڵپووزی زینیدا شۆڕ و بەقایش و ئاوزوونە بەنددەکرێ.

**پێشتەماڵ:** پشتەماڵ. (کە.) سەرپۆشێکی سووکە ژنان لە ماڵەوە بە سەری دادەدەن، کە بیانێکیان لێ میوان بێ.

**پێشتر:** بەرتر، بەرووتر (کەل.، زەن.). پێشووتر، نزیکتر: فیسارکەس لەمە لەپێشترە.

**پێشترین:** پێشووترین، بەرترین، نزیکترین.

**پێشجەنگ:** سەرجەنگ، قەرەوڵ.

پێشچاوک

**پێشچاوک** (باک.): چاویلکە.

**پێشچاو:** بەرچاو، دیمەن.

**پێشچاوکە** (کۆ.): بەرچاوکەی کەرێ. پێشەسەری زێڕ یا زیو (خشڵی ژنانە).

**پێشخانە:** لیوان، نێڤکۆ، دالآن.

**پێشخڕ:** سەلەم، سەوزخڕ.

**پێشخزمەت:** نۆکەر، بەردەست.

**پێشخستن:** پلە زیادکردن، بردنە پێشەوە.*

**پێشخواردن:** لەپێش پادشا و میراندا چێشت تامکردن.

**پێشخۆر:** پشخۆر، پێشمەرگە. پێشەکی.

**پێشخۆری:** دەوری، دەفر، قاپ.

**پێشدا:** یەکەمین کەسێکە، کە داد و گازاندەی کردبێ. ـــ ی: گازاندەکەری هەرەپێش.

**پێشدار:** هۆمان، فەرماندەر. (باک.) پێشڕەو. پێشمەرگەی لەشکر. ـــ ی: هۆمانی، فەرماندار، پێشڕەوی.

**پێشدەرامەت:** پێشدەستی.

**پێشدەرگا:** دەرماڵ، (هەورا.) دەرووبەری، دەربندار.

**پێشدەرگانە:** ئاستانە. پلیکانی پێشدەرگایە.

**پێشدەست:** لەبەردەست.

**پێشدەستە:** پێشیگە.

**پێشدەستی:** دەست ڕەپێشخستن.

**پێشڕەو:** ڕێ نیشاندەر، ڕێبەر. ـــ ی لەشکر: قەرەوڵ. پێشمەرگە. سەرەتا.

**پێشڕەوی:** ڕابەری، ڕێ نیشاندان.

**پێشڕوو:** بەردەم.

**پێشزان:** پێش بین، پێشگۆ.

**پێشزانی:** پێش بینی، پێشگۆیی، پێشگۆتن.

**پێشقەرەووڵ:** پاسەوان، پێش جەنگ.

**پێشقلیان:** بەردڵ، ناشت، بەرچا.

**پێشک** (باک.): جووره نەخشێکی درووماننییە. لای پێشەوە.

**پێشکار:** سەرکار، بەردەست، کەڤانۆ، شەهین، پاکار، یاریکار. ـــ ی: بەردەستی، سەرکاری، نۆکەری.

**پێشکە** (کۆ.، هەو.، خۆ.): مێشوولە.

**پێشکەپی:** هاوکار، هاوپیشە. تاسب، چاولێکەر.

**پێشکەپیتی:** هاوکاری، هاوپیشەیی، تاسبی.

**پێشکەش:** پێشکێش، دیاری. بەرتیل. ژێر زووان، زووان گوشالانە. ـــ کردن: بەرانین.

**پێشکەوتن:** پێشڤەچوون، کەتن پێش.

**پێشکەوتوو:** پێشکەوتی، پێشکەفتی.

**پێشکۆ:** قەڵپووزی زین، بەرکۆ، بەرزین، زینکۆ.

**پێشکی** (باد.): گڕوێ، گوڕی.

**پێشکێش:** پێشکەش. لەپێشدا ئەو ووشەیە تەنها بۆ ئەسپێکی باش بەکاردەبرا، کە پێشکەش بەگەورە و مەزن و میر وخونکاران دەکرا و لەپێشەوە دەکێشرا بۆ لای ئەو کەسەی، کە بۆی دەچوو بەلآم لەو دوواییەدا بۆ ئەو دیاری و خەلآت بۆ هەموو جووره چت و بۆ هەموو کەسێکی. ـــ کردن: بردنەپێش، هێنانەپێش. بەخۆڕایی چتێکدان بە کەسێکی.

**پێشگا:** پێشگە، بەرچاو. گۆڕ و ئارامگەی پادشایان.

**پێشگاپیلکە:** باڵندەیێکی بەڵەک و چکۆڵەیە بەدەوروبەری جووتیدا دێت و دەچێت.

**پێشگر:** بەرگر، پێگیر، بەرهەڵست. ـــ ی: بەرگری، پێگیری، بەرهەڵستی.

**پێشگۆ:** دمڕاست، سەرۆک، وەکوو لەپێش بەیداخی شاریدا ئەوا ئەسپی دەئاخێوێ لەسەر تیپی سوپاسالار و هەم پێشگۆ و دونداره. پێشزان، پێش بین، دووربین.

**پێشگۆتن:** پێشگۆتنک، سەرەتا، دیباچە. پێشزانین، پێش بین، دووربین.

**پێشگۆتنک:** بڕوانە: پێشگۆتن.

**پێشگوشاد:** بەربەرەلآ، پێش بەڕەلآ. ـــ ی: بەربەرەلآیی، پێش بەڕەلآیی.

**پێشگیر:** خاوڵی. بەرگیر، (هەو.) بەرکۆژە. ـــ ی: بەرگیری.

**پێشگیره** (هەو.): فۆتە. مەهمل. بەرهەڵبێنە، (باک.) برڤالەک. چادرک.

**پێشل** (موک.): پێشێل.

**پێشنگ** (باک.): پێشەنک. لای پێشەوە.

**پێشماڵ:** بەرمالآن، پێشەوەی ماڵی. پشتەماڵ، خاوڵی. پەردەیەکە ژنان بەخۆیانەوە دەگرن.

**پێشمالآن:** بەرمالآن، وەرووبانا.

**پێشمامان:** ئافرەتێکە لە بەردەمی ژنێکی زەیستان دادەنیشێ بۆ ئەوەی لەنگەری ڕاگرێ لەکاتی منداڵبوونیدا.

**پێشمەرگە:** سەرباز، هەیتە، مفردی، سوپایی. ـــ ی پیادە: سەگمان. پێشخۆر: کەسێکە لەپێش گەوراندا تامی نان و چێشتی بکا بۆ دڵنیایی. چەند کەسێکن لەپێش لەشکرەوە دەڕۆن بۆ تاقیکردنەوەی ڕیگا.

**پێشنمێژ** (باک.): پێشنوێژ، بەرغێژ. پێشنوێژیکەر.

**پێشنووێژ:** (زەن.) بەرنوێژ. پێش نیوەڕۆ کاتی پێشنوێژی.

**پێشنووێژکە:** مینبەر.

**پێشنووێژی** : پیشەو کردەوەی پێشنوێژی (امام).

**پێشنیاد:** پێشنیاز.

**پێشنیاز:** پێشنیاد.

**پێشوو:** پێشی، پێشین، بەر، بەروو، (باک.) بەریدە. ڕابردووی کۆن. بەرین، (هەورا.) نووا. (باک.) مێشوولە.

**پێشواز:** پیری، پیرائی، بەرەوپیر، بەپیرەوەچوو. ـــ ی کردن: بەپیرەوەچوون. ـــ ی: بەپیرەوەچوون. ـــ کردن: بەپیرەوەچوون.

**پێشووتر:** بەرتر، بەرووتر، پێشتر.

**پێشووترین:** بەرترین، بەرووترین، پێشترین.

**پێشۆر:** لێواری حەوزێیە پێی دەخرێتەسەر.

**پێشووکورک** (باک.): مێشوولەی وورد.

**پێشوولە:** مێشوولە، پێشکە.

**پێشوونیان:** پێشینیان، وەرێنان.

**پێشووێن:** شوێنی پێخوست، ناوونیشان، پێناس، نێوونیشان، ئادرێس. وە ـ کەوتن: لێپێچانەوە، تۆژانەوە.

**پێشووێنیکار:** پێناسی کاروبار.

**پێشهاتن:** هاتنەپێش. ڕوودان، قەومان. (ئەردە.) ڕێکەوت.

**پێشی** (باد.): مێشوولە. بەردەم. پێشوو، بەروو. ئایندە. لە ـ ا دە: لەپێشان. لە ـ ا مەدە: لە دوارۆژ و ئایندەی ئێمەدا. ـ ا چوون: توورشبوون.

**پێشیا** (باک.): پێشینان، پێشینیان.

**پێشی بەند:** کوللە، مێشوولەبەند، پەشەبەند.

**پێشیل:** شوێنێکە، کە بەهۆی هاتوچۆی زۆرەوە بەسەریدا شێلرابێ

**پێشی مام** (یەز.): پێشەوا، ڕابەر.

**پێشین:** پێشوو. پێشەکی. لەمەوپێش.

**پێشینی:** پێشینیان.

**پێشینان:** پێشینیان.

**پێشینی گەل** (ئەردە.): پێشینان، پێشینیان.

**پێشینیان:** پێشوونیان، پێشینان، باب و باپیری کۆنی هۆزێکی.

**پێشینیان:** پێشینان.

**پێشیو** (یەز.): پێشەوا.

**پێخام:** پێخەم، وەڵام، نامیلکە. پەیام، ڕاسپاردە.

**پێخەم:** پەیغام، وەڵام، نامیلکە.

**پێغەمبەر:** پەیغامبەر، وەڵامبەر، وەڵامدەر، ڕاسپاردەبەر، ڕاسپاردەگەیێن. ناردراو. وەخشوور. کەسێکە لەلای خوداوە ناردرابێ بۆ ئەوەی ئاخۆتنی چاک و کرداری چاک و بیر و باوەڕی چاک فێری مرۆڤان بکات و لە خراپەیان دوورخاتەوە.

**پێغەمبەرایەتی:** پێخەمبەرایەتی، وەڵام بردن.

**پێغەمبەری:** پێخەمبەری.

**پێفرک:** ئوتۆمۆبیل، خشۆک.

پێفرک

**پێ فێربوون:** لێراهاتن.

**پێ فێرکردن:** لێراهێنان.

**پێف** (باک.): پەیڤ.

**پێقەهاتن** (باد.): بە ـ : توانین، لەدەست هاتن.

**پێقەلە** (سەق.، سنە.): قجیلە، قنجیلە (گیایەکە دەخورێ تامی گەڵا توورِ دەدات)، نانەقەلە.

**پێقوتکە:** هەڵپەرکێی گەرم. سەرچڵی و هەڵبەزهەڵبەز.

**پێک:** ساز، ڕێک، بەیەک، بەیەکتری. ـ شادبوون: بەیەکتری شادبوون. ـ گەیشتن: بەیەکتری گەیشتن. تەکووز. ـ هاتن: ڕێککەوتن، سازبوون، سەرکەوتن. هی ئیشێ مە ـ نەهاتییە: واتە تەکووز نەبوویە. (باک.) پەککوو! ئۆخ. (دەر.) پاک. بەشێکە لەو خواردنەوەمەنییەی، کە سەرخۆشی دەدا.

**پێکان:** وەبەرکەوتن، بەرکەتن، خرچان، ئەنگێوران، بەرکەوتن، ئەنگووان، خچان، تێهەڵچەقان، خێچان، لێدران، لە نیشانەدران. لێدان، ئەنگاوتن. زانین، هەڵدان. مەبەس لە دۆزینەوەی واتای هەڵبەستێکی نادیارە، ئازاد واتای هەڵبەستەکەی خانی پێکا: زانی.

**پێکاندن:** ئەنگاوتن، لە نیشانەدان، خرچاندن، وەبەرکەواندن.

**پێکانن:** پێکاندن.

**پێکانین:** پێکهێنان.

**پێکاو:** لێدراو، ئەنگێوراو، ئەنگاوتراو.

**پێکاهاتن:** هاتوچۆکردنی چەند کەسێک بەناڕێکی و پەرێشانی.

**پێکەر:** ئەوکەسە یان ئەو شتەیە، کە کارەکە دەکات.

**پێکەفتن:** لێوەشانەوە، لێهاتن (بۆ جل و بەرگ). سازان، خاس و چاک بوون. دەرمانەکە بە نەخۆشەکە کەوت.

**پێکەنانن:** کەنانن.

**پێکەنین:** کەنین، (فە.) خەنین، (دەر.) پەیخەندین، گرژینەوە، (هەورا.) خوایی. دەم بە ـ : دەقکەن، دەقکەنۆک. ڕووخۆش. بە قاقا ـ : تریقاندن. تریقەی ـ : قاقای پێکەنین.

**پێکەو:** گیایەکە دەخورێ.

**پێکەوە:** وێکرا، وێرا، لەگەڵ یەک، لەگەڵ، لەگەڵ یەکتری، بەیەکەوە، پێکرا، تێکرا، لەسەریەک، پێکڤە، (باک.) دهەڤدە، دگەل هەڤ. بهەڤ، پەڤ، پشەهەڤ. وەکەهەڤ، سەرهەڤ، بتەڤایی. (دەر.) بەی بووەوە. ژۆروژێر، ڤێکرا. ـ چوون. ـ ڕابووراردن.

**پێکەوەبوون:** پێکرابوون، لەگەڵ یەکتری بوونی دوو یا چەند چت و یان گیان لەبەر.

**پێکەوەنان:** لێکنان، پەرتووک پێکەوەنان: لێکنان. بەشەڕدان، تێکبەردان.

**پێکەوتن:** وێکەوتن، منەکردن، بەسەرکردنەوە، بەدی هێنان. ڕێکەوتن، دەستدانی چتێک بۆ چتێکی تر. دەرمان ـ : بوونە مایەی چابوونەوە و ڕزگاری لە نەخۆشی. (ڕەوا.) ڤێگرتن، فێ لێهاتن.

**پێکچوواندن:** وێچوواندن، وێکچوواندن.

**پێکچوون:** وێکچوون، لێکردن.

**پێکداهاتن:** شەڕ پێ فرۆشتن، پێکدادان.

**پێکر:** بکەر.

**پێکرا:** پێکەوە، بەیەکەوە، بەیەکریان، تێکرا.

**پێکران:** لەدەستهاتن، پەرژان، کات دەستخستن، دەرفەت بوون. توانایی کردن هەبوون، دەسەڵات بەسەرداشکان. ئابڕووبران، جنێوپێدران، ئەتک کران، ڕیسواکران. هەڵکران وپێکرانی چرا و ئاوور.

**پێکراو:** ئەنگێوراو. کابرا بە زۆر فیسارە کاری پێکراوە بۆ خۆی پێی خۆشنەبووە ویەدەست خۆشی نەبووە. بێ شەرم، بێ ئابڕوو، زمان درێژ، چەختی، سوواو، پەل، چەقەسوو، جەربەزە، ئابڕووبراو، ئازارکراو. هەڵکراو (بۆ چرا و ئاوور).

**پێکردن:** کار بەزۆر بە کەسێکی کردن. ئابڕووبردن، نەتک کردن. سەرزەنش کردن، بەسەرڕژیشتن. (سوور.، هەو.) چرا و یا ئاوور هەڵکردن بە ئەندازەبوون؛ کەوشەکە پێیکرد.

**پێکزین** (هەو.): پشمین.

**پێکفە** (باد.): پێکەوە.

**پێک کردن** (خۆ.، دزە.): کردنە هاوبەش لە گەمە و چتی وادا؛ پێکت ناکەم: لەگەڵت ناکەم و ناتکەمە هاواڵ و بەشدار. لێکچوون، پێکچوواندن.

**پێک گەیاندن:** وێکهێنان.

**پێک گەیشتن:** تووشی یەکتری بوون.

**پێک گرتن:** ئەندازەی چتێکی بە چتێکی تر گرتن.

**پێکمانەوە:** لە وەڵامی جەژنە پیرۆزەی خەڵکیدا بەکاردەبرێ واتە جەژنەی هەردووک لامان پیرۆزبێت.

**پێکنای** (هەورا.): هۆنینەوە.

**پێکۆ** (شەبە.): دەهۆڵ لێدان. پێکوت: پێپەست، پاکوت.

**پێک و پێک** (دەر.): پاکەوپاک.

**پێکۆترە** (کۆ.): پنجە گیایەکی سێ پەلکەیە گەڵایەکانی وەپێی کۆتری دەچێ و بەزەویدا پان دەبێتەوە.

**پێکورە:** فەرخە کوللەیە، کە هێشتا باڵی نەگرتبێ تازە خەریکی پێ هەڵگرتن بێ. دەست و پێوەند ونۆکەرە.

**پێکۆز:** ڕایێخی گیاییە بۆ بێچووە ئاژاڵان ڕادەخرێ.

**پێکوڵ** (موک.): قونجریسکە، (موک.) پێکوڵە، (شنۆ.) قونجلیسکە، (ڕۆژ.) پەیکوڵە. گیایەکە قولانجێک بڵند و توولەدارە، بەزەویدا بڵاو دەبێتەوە، کە ووشک بوو جوورە دەنکێکی دێنێ دڕووی تیژی درێژۆکەی سێ سووچی پێوەیە، دڕووەکانی لەنووسەنەکەی درێژ و تیژترە. ـــ چاندن: تێچاندن. دووزمانی، پۆڵککردن. ـ چێن: دووزمان. (هەو.) گڕووگرتنی منداڵە و گریانیەتی لە کاتێکا پێ لە زەوییەوە دەوەژێنێ و نایەتە لای کەس. سمکۆڵ. شەڕفرۆش.

**پێکوڵە:** پەیکوڵە، سێ ددانکە. پێکوڵ.

**پێکوڵەجاڕ:** پەیکوڵەجاڕ، جێگایەکە پێکوڵەی زۆربێ.

**پێکۆڵی:** سمکۆڵ.

**پێکهاتن:** هەڵسووڕان، ڕێککەوتن، ئاشتی، وێک کەوتنەوە، ئاشت بوونەوە، جێ بەجێ بوونی کاروبارێک.

**پێکهاتوو:** ڕێککەوتوو، دروستبوو، ئاشت.

**پێکهانین:** پێکهێنان، جێبەجێکردنی کاروبارێک.

**پێکهێنان:** پێک هانین.

**پێکهێنانەوە:** سەرلەنوێ پێکهێنان، ئاشتکردنەوە.

**پێکیان:** ئەنگێوران، لەنیشانەدران، لێدران، شکان.

**پێکێشان:** سەرکێشانی کارێک بۆ کارێکی تر؛ ئەو کارە پێدەکێشێ بۆ زوویری و دڵێشان.

**پێگاف** (باک.): هەنگاو، شەقاو.

**پێگان** (باک.): نەخۆشی، دەرد، ئازار.

**پێگە** (سەق.): تەویلە.

**پێگەرمۆک** (باک.): سەیران، گەڕان.

**پێگەنە** (هەورا.): بێرەدا.

**پێگەه** (باک.): لەشکر، ئۆردوو، هۆردوو. ئێردیوانی دووسەرە.

**پێگەیاندن:** پەروەردەکردن، گەورەکردن. بەرهەمهێنان. وەدووخستن. دەرهێنان، ڕوونووس. زوو ـ : هۆرکرن. گەیاندنی قسەیەک یا چتێک بە یەکێک.

**پێگەیشتن:** پێگەیین، بەگەیشتن بۆ میوە و چێشت. گەیین. پێراگەیشتن: بەئاوات گەیشتن، بە ئارەزوو گەیشتن، قاڵەپێکردن، پێیاگەیشتن. بەیەکتری گەیشتن، تووشهاتن. گەورە بوونی منداڵ و لە خەم ڕەخسین.

**پێگەیشتوو:** چتێکە بەبەرهەم هاتبێ و پێگەیشتبێ، پێگەییو.

**پێگەییگ:** پێگەیشتوو، پێگەییو.

**پێگەیین:** گەیشتنی بەری دار و ئیتر، میوە و چێشت پێگەیشتن. پێک گەیشتن، گەیشتنە یەکتری، تووشی یەکتری بوون. شەیتان پێ پێکەنین، خۆناسین. گەیین، گەیشتن.

**پێگەییو:** پێگەیشتوو.

**پێگر:** پەڵپگر، پێشگر.

**پێگران:** (دەر.) پاگران.

**پێگرانی:** (باک.) پاگرانی.

**پێگرە:** پێشگرە.

**پێگرتن:** کەوتنە سەرپێی گیانداری ساوا، پێهەڵگرتنی ساوا. پەڵپگرتن، پێشگرتن. ئەندازەی چتێکی بە چتێکی گرتن. پێوان.

**پێگرتی** (باک.): خەریک، لەزگ.

**پێگرۆک** (باک.): تەڵە.

**پێگری:** پەکخستن، پێشگری، پەڵپگری.

**پێگوتن:** پێکوتن، پێ ووتن.

**پێگورک** (باد.): گیایەکە گەڵایەکەشی وە پەنجەی گورگی دەچی و دەشخورێ.

**پێگۆزەک** (باک.): سینک، گوڵمێخ.

**پێگوهۆرک** (باک.): مێردی خوشک لە گۆڕینەوەدا.

**پێگیر:** پێگر. ـ ی: پێگری.

**پێگێرە** (دزە.): پێ هۆرە، (ڕۆژ.) پێ هۆڵە. (دەر.) پاگێرە. گێرەکردن بە وولاخان. ئەوەیە، کە گێرەی لەسەر دەکرێ.

**پێل** (باک.): دەشت، بیابان. چاخ، کات، دەم. شەپۆل. (باد.) شەپۆلی گچکە. کات، دەم، پێڵەک: دەمێک. شەپک، شەپیلک.

**پێڵ:** کۆپارەی سەر ملی گاجووت. شان و مل. پرد، پر.

**پێلا** (ئەردە.): پێڵاو.

**پێلاڤ** (باک.): پێڵاو.

**پێلاڤچێکەر:** کەوشدروو.

**پێلاقە:** بڕوانە: پێلەقە.

**پێڵاو:** کەوش، سۆل، پاپۆش، پێتاو، پێلاڤ. پالاو، (هەورا.) پالـە، (باد.) پێلاڤ.

**پێڵە** (موک.): کەڵ یا گامێشێکە شاخی بە پشتەوەدا شکابێتەوە یا شاخێکی خوار بێ. بۆ هەموو چتێکی تریش بەکاردەبرێ، کە بەپاشەوەدا شکابێتەوە. (ئەردە.) پێڵووی چاو. (بل.) ژنێکە سەرتاوسی بێ واتا پێشەسەری تووکی لێنەهاتبێ و پێستی ڕووت بێ. گایەکیشە شاخەکانی بۆلای پێشەوە درێژ و کەمێکیش خوواربووبێتەوە. ڕەشەوولاخێکە شاخەکانی بۆ لای چەنەگەی خوواربووبێتەوە. مرۆی بەدمەست. (ئەردە.) قۆزاخەی کرمی ئاوریشم. پیلوو.

**پێڵە** (فە.): پێڵاو.

**پێ لەپاش:** پەشیمان. ــ ی: پەشیمانی.

**پێ لەزەوی نەکەوتن:** مەبەس لە زۆری کەیفوخۆشێتییە.

**پێلەقە:** پێلاقە، بە یەک پێ بەهێز بە یەکێکی دادان.

**پێلەقلەق** (باد.): دەرزیلە، گیایەکیشە.

**پێلەکە** (ژمن.): پووڵ، پارە، دراو.

**پێلەگلەگ** (باد.): گیایەکە گەڵاکەی پەنجەی لەگلەگی دەچی.

**پێ لەو ماڵی نەنان:** مەبەس لەوە، کە جارێکیتر نەیەتەوە ئەو ماڵە.

**پێلەپلک** (باک.): بەڕادە، ئاقەند. پایە، ڕوتبە، پلە.

**پێلەوار:** پێڵەوار. بڕەداری ئەستووری سووتاندنییە. پیلەوار.

**پێلپێلووک** (باک.): تموج، شەپۆل لێدان.

**پێلپینە** (باد.): پەڵپینە، جوورە گیایەکە.

**پێلچۆک** (باک.): شەپۆل.

**پێڵوو** (هەورا.): (هەورا.) پێڵە، پیلوو.

**پێ لێبڕین:** واز لە هامووشۆی یەکێکی هێنان.

**پێ لێهارلاتن:** چاوەدێری کردنی چتێک بۆ ئەوەی، کە پێی لێنەنێ.

**پێ لێخستن:** مەبەس لە چاوقووچاندنە لە چتێکی و لەسەر نەڕۆیشتنی.

**پێ لێداگرتن:** مەبەس لە زۆرکردن لە کەسێکی و میچ لەسەرگرتن بۆ کارێک. دانەراندنی پێی ئاش بۆ وورد هاڕینی.

**پێ لێراکێشان:** پشت لە کاروکردارێک کردن.

**پێ لیسک** (باک.): دەرفەت، هەل.

**پێ لێنان:** پێ لەسەردانان، پالینان، ددان پێدانان، درکاندن. پەردە لەسەر لابردن، ئاشکراکردن. ڕاستی ووتن.

**پێ لێنەر:** درکێنەر، ددان پێدانەر. پالێنەر.

**پێ لێوەرگێڕ:** تەنراوێکە لە کاتی تەنینێدا جۆلاّ پێی بەلایەکیدا وەردەگێڕی ئەوسا تەنراوەکە دووباد دەبێ.

**پێ لێهەڵبڕین:** دەست درێژی، شووڵێ هەڵکێشان، پێ لە بەرە تێپەڕاندن، پێ لێهەڵێنان.

**پێ لێهەڵکێشان:** شوو لێهەڵکێشان، پێ لێهەڵێنان.

**پێ لێهەڵێنان:** پێ لێهەڵکێشان، شوو لێهەڵکێشان، پێ لێهەڵبڕین، دەسدرێژی کردن، تێپەڕین.

**پێما** (باک.): شرەگر. پاشماوە، ماوەوە.

**پێمان** (دەر.): پێوان. (باک.) پەیمان، بەڵێن. (باک.) پیمان.

**پێمانە** (هەورا.): پێوان.

**پێمانەکار** (هەورا.): ئەندازیار.

**پێمای** (هەورا.): پێوان.

**پێماین** (دەر.): پێوان.

**پێمەڕە:** مەڕە، مەڕبێر، بێل. خاکەناز.

**پێمەلە:** جوورە مەلەیێکە بەپێوە بەجوولاندنی، هەردووک پێیان دەکرێ.

**پێمسۆت شەکری عەمبارنێم سۆت** (هەو.): گەمەیەکی تێکڕایی کچ و کوڕانە.

**پێ مردن:** تێچوون، تێداچوون، لەناو چوون.

**پێ مریشکە** (باد.): گیایەکە گەڵاکەی وەک پەنجەی مریشکێ دەچێ، پەرداوە.

**پێمزگ:** بەخشش، کرێ.

**پێمێرد:** پیاوی خودا، عیزرائیل. لە چریکەی مەم و زین لاپەڕە ۲۵۲ دا نووسراوە: (ئەوەدەمی سوپاسبژێرم ئەگەر پێمێردی خوڵام بێتە سەری بۆ گیانکێشانێ).

**پێمیو** (ڕەوا.): قایەی مێوانە. دارێکە وەبەر مێوان بدرێ بۆ بەرز بوونەوەی.

**پێن:** (هەو.) شەق، شەپ. ــ لێدان: شەپ لێدان. (ڕۆژ.، دەر.) پان. پارازتن.

**پێنازین:** شانازی کردن، خوڕین و نازین بە یەکێکی.

**پێناس:** پێشووێن.

**پێناسین:** ناسینی چتێک بە یەکێک.

**پێناو:** پێشبار، قوربانی، گاووگەردوون. ڕێ، مایە، پۆ، هۆ. لە ــ ی تۆدا تووشی زیان بووم: واتە لە ڕێی تۆدا. خۆ لە ــ نان: خۆکردنە قوربانی. سەر لە ــ نان: سەردانان، سەر لە ڕێگایەکیدا کرنە قوربانی. دەلاڵ، نێوبژیکار. (خۆ.) دەلاڵێکە لە نێوانی کوڕ و کچاندا هاتوچۆیە بکات.

**پێناودار:** بەرپرسیار. ــ ی: بەرپرسیاری.

**پێناوی:** نێوبژێتی، دەلاڵی. ــ کردن: نێوبژی نێوانی شەڕوشۆڕ و کچ و کوڕاندا کردن.

**پێنایی:** پانایی، بەرینی، بەرینایی.

**پێنەبوون:** لەلا نەبوون، لەکن نەبوون.

**پێنەزان:** سپڵە. ــ ی: سپڵەیی.

**پێنەزانین:** سپڵەبوون.

**پێنەشان:** مارەیی لێک نەهاتن، دروست نەبوون.

**پێنەشاو:** مارەیی لێک نەهاتوو.

**پێنەکردن:** پڕ بەپێ نەبوونی کەوش و نیترە.

**پێنەگەییگ** (ئەردە.): نەگەیشتوو، شەیتان پێ پێنەکەنیو، خوێنەناسیو. کاڵ. کرچ، پێنەگەیشتوو بۆ میوە وئیتر. نەکوڵاو، خاو بۆ چێشت.

**پێنج:** پەنج (٥).

**پێنجان:** تەنیا پێنج.

**پێنجە** (باک.): پەنجا (٥٠).

**پێنجەم**: پەنجەم، چتێکە لە ڕیزی پێنجاندابێ.

**پێنجەمین**: پەنجەمین.

**پێنجەیتار**: پێنج ڕۆژە لە نێوانی زستان و بەهارێدا، کە ساڵ تەواوبوو ئەو پێنج ڕۆژانە دەمێنێتەوە لەپێشدا پێشونیان ساڵیان بە دوازدە مانگ و مانگیشیان بە (٣٠) ڕۆژان دادەنا بەوپێیە ساڵ سێ سەدوشێست ڕۆژە پێنج ڕۆژیش دەمێنێتەوە لە ساڵی ڕاستەقینە لەسەر هیچ مانگێکی نییە.

**پێنج بەری** (باک.): بزنێکی پێنج ساڵانەیە.

**پێنج برینی**(باک.): مەڕی پێنج ساڵانەیە، (باک.) پێنج بەری.

**پێنج تیر**: تفەنگ یا دەمانچەییێکە، کە پێنج تیران بخووات.

**پێنج چاوگەی دڵ** (ئەردە.): پێنج هەستەکانن: وەکوو دیتن، بیستن، بۆنکردن، تامکردن، دەستلێدان (لێک کەوتن).

**پێنج خشتەکی**: پەنجەک. چەشنە هەڵبەستێکە، کە سێ نیوە هۆنراوەی تری خرابێتە سەری و دوواییەکەیان لەسەر شێوەی پاشبەندی نیو هۆنراوەی یەکەم بێ.

**پێنج دەری**: پەنجەرەییێکە پێنج دەرگای هەبێ.

**پێنج ڕۆژەی تار**: ژمارەیێکە لە ڕۆژانی ساڵێ ئەویش پێنج ڕۆژە دوو ڕۆژی وەبەر کۆتایی زستان و سێ ڕۆژیش دەکەوێتە سەرەتای بەهارێ. تار.

**پێنجشەمە**: پێنجشەمب، پەنشەمە، پێنجشەمۆ.

**پێنجشەمب** (باک.): پێنجشەمە.

**پێنجشەمۆ**: پێنجشەمە.

**پێنج گا**: جوورە گۆرانییێکی کۆنی کوردییە.

**پێنج گەنج**: پێنج چاوگەی دڵ. پێنج گەنجینە.

**پێنج گەنجینە**: پێنج چاوگەی دڵ، پێنج گەنج.

**پێنج گۆشە**: پێنج سووچ، پێنج قولینچک.

**پێنج گۆشەیی**: ئەو شێوە ئەندازەییەیە، کە پێنج لا و پێنج گۆشەی هەیە.

**پێنج لا**: پێنج گۆشە، پێنج لک.

**پێنجووار**: پێشبار.

**پێنجۆک**: چەمۆڵە، چەمبۆڵە.

**پێنجووێن**: شارۆچکەیەکی گچکەیە. نێوەکە لە پێنج وێن یانی پێنج یۆنانی پێکهاتووە.

**پێنجی** (باک.): پەنجا(٥٠).

**پێنج یەک**: لە پێنج بەشان بەشێک.

**پێنچووار**: لە پێنج بەشان چوار.

**پێندقە** (باد.): ئەو بەشە هەنگووینەیە، کە ڕەش ڕەشە و ڕەواق نییە. کرێژی هەنگووین.

**پێنکە** (دزە.): پەیینکە.

**پێنکی** (ئەردە.): وەنەوزە.

**پێنگاف** (زا.): شەقاو، هەنگاو. شەقام.

**پێنگی** (ئەردە.): وەنەوزە، خەوەکوتکێ.

**پێنووانـدن**: بەسەرهێنانی کارەساتێک بەسەر یەکێکیدا لە تۆڵەی کردەوەیەکی خراپ؛ ئەریمان سووێندی درۆ پێی نوواند.

**پێنووس**: خامە، قەڵەم.

**پێنووسبڕ**: قەڵەمبڕ.

پێنووس

**پێنۆکە**: گیایەکی بۆنخۆشە گوڵێکی سپی هەیە.

**پێو**: پێوەر، ئەو کەسە یا ئەو چتەیە زەوی دەپێوێ بەلآن بەتەنێ بەکارنابرێ، وەکوو: زەوی پێو، ئاسمان پێو، گەنم پێو. (فە.) جێگای نەدیو.

**پێوبوون**: لاوابوون.

**پێوار** (باد.، هەورا.، زەن.): نادیار، نەدیو، گوم، بزر، وون. پەنا، پەسیو. ــ بوون: بزر و نەدیوبوون.

خودا داد لەدەس مامەڵەی فەلەک

خستی وەپێوار چەرمووی چاوبەڵەک

لەکاتی تووڕەییدا لەجیاتی بچی و نەگەڕێتەوە و شووێن بڕێ، (بە قوڕداچێ) بەکاردەبرێ.

**پێواز**: پێباز.

**پێوان**: بەمست یا بەبست یا بە چتێکی دیکە ئەندازەی هەرچتێک وەکوو دەغڵ و دان و زەوی و شلەمەنی بگیری ــ ی پێدەڵێن. (دەر.) پێماین، پێمیان. (باک.) پیڤان. ئاگاداری، ووشیاری، پاسەوانی.

**پێوانە**: پەیانە. کیلە، ئەو دەفر یا بادیەیە، کە شلەمەنی پێ دەپێورێ، پێوان. ــ کردن: کیلە پێوان.

**پێوانن** (ئەردە.): پێوان.

**پێوانی بەرزەپێو**: پێوانی قەلآبەجن.

**پێوە**: بەوییەوە، بەوەوە، (هەورا.) بۆوە. ــ بوون: بۆوەبوون، دووچاربوون، تێ ئالقان، تووشبوون، گرفتاربوون، خەریکبوون. ــ کردن: دووچارکردن، تووشکردن، ئاڵقاندن، تێ ئاڵقاندن، گرفتارکردن. خۆ ــ کردن: خۆ تووشی ڕرووشە و گێچەڵانکردن. خۆ خەریککردن.

**پێوەبەرپێدان**: بەرپێن.

**پێوەبوون**: پۆوەبوون، تووشبوون، دووچاربوون، تێئاڵقان، گرفتاربوون. خەریکبوون، گیرخوواردنی چتێک بە چتێکەوە یا لەچتێکیدا. ماوەی ڕۆیشتن، ماوەی پێوە خەریک بوون.

**پێوەتر** (باک.): پتر، زۆرتر.

**پێوەتلیان** (ئەردە.): تێکەڵاوبوون، تێوەچوون.

**پێوەچوون**: بەدەمەوەچوون، (دەر.) بەدەمەوەچین. ڕۆیشتن بەدەم چتێکەوە. تێوەچوون. وەدووکەوتن، بەپێوشووێنەوەچوون. سەر لە نەخۆشدان، سەر لە بووک یا لەو کەسەدان، کە لە ڕێبواری هاتبێتەوە.

**پێوەخستن**: وێخستن، پێداهەڵاوەسین.

**پێوەدان**: دەرگا بەستن، دانەوە، جفتکردن، داخستن، گاڵەدان. (هەورا.) پووەدای، دای پۆ، نچکدان، مچکردن، پێڤەدان، بەستن. پێوەنووساندن، چەسپاندن. چزەلێهێنان (گەزتن، بۆ دووپشک ونێتر). نچاندن، چزاندن، چزانن. چزوو تێڕاکردنی چزوودار لە لەشی گیانداران. نان بە تەندووردوەدان.

**پێوەدەر:** داخەر. وەزەن بۆ مار و ئیتر.

**پێوەدران:** داخران.

**پێوەر:** دووین. ئەندازەگر.

**پێوەرە:** دارەدارەکردنی منداڵان. (موک.) بەری هەرە دووایی وێنجەیە.

**پێوەربوون:** تێوەرووکان. پەرت و بڵاوبوون.

**پێوەرکردن:** پێوەکردن، پێداپاشین، بڵاوکردن، چرقاندن. خوێ بە چێشتی وەرکردن. وێڵ و بەرەڵاکردن.

**پێوەرۆیشتن:** پێوەچوون. هەڵوەشان یا درانی شوێنێک، کە کەمێک لە خۆیەوە هەڵوەشابێ یا درابێ: کەواکەت بدرۆوە با لەوە پتر پێوە نەڕوات.

**پێوەری:** دووان.

**پێوەژاندن:** تێوەژاندن، نەقیزەلێدان بۆ خێرا ڕۆیشتن.

**پێوەژەنن:** پێوەژەندن، تێوەژەندن. ئاژنینەوەی قامک یا دار.

**پێوەستان:** پێوەران، دەرەقەتهاتن، (دەر.) پەی ویرستی.

**پێوەکردن:** تێهەڵکێشان، دەزوو بە دەرزییەوەکردن، وە بۆ هەموو چتێک بەکاردەبرێ، کە بە چتێکی ترەوە بکرێت. بۆ هەموو گیان لەبەرێکی بەکاردەبرێ، کە تووشی پەلێک، تەڵێک یا تەلەزگەیێکی بکرێ. تووش و گرفتارکردن. گۆشت بە شیشەوە و یا دەزوو بە دەرزیەوەکردن.

**پێوەگرتن:** چتێک کردنە پەردە بۆ چتێکی تر وەکوو فۆتە بەخۆوەگرتن، پەردە بە پەنجەرە و دەرگا و چیغ و سەربانەوەگرتن. ڕووی چتێکی داپۆشین.

**پێوەن (ئەردە.):** پێوەند.

**پێوەنان:** داخستن، پێوەدان (دەرگا). خۆ ـــ: وەبەرحنچکاندان، لێژەنین، وەبەرحەنگاندان، چتێک بە چتێکی ترەوە نووساندن. پیستێکلی، زەهفکرن، گەردان.

**پێوەند:** پەیوەندکردن، (جا.، ڕۆژ.) پاوەن. (باک.) پاچەبەند، پێ بەند، پابەند، پابەست، دەست بەند، سنەم، سەدەم، مەرین، مەربەند. ـــ کردن: زنجیر لەپێی گرتن و وڵاخانکردن. سندەمکردن. ئاسنێکی زنجیردارە دەکرێتە پێی گیراو و وڵاخانەوە.

**پێوەنووسان:** چەسپان، نووسان، لکان، چەسپین، (باک.) دەبوش. ـــ دن: چەسپاندن، پێوە نووساندن، لکاندن.

**پێوەنووساو:** چەسپاو، لکاو.

**پێوەنووسێن:** چەسپێن، نووسێن.

**پێوەنیشتن:** پێوەلاتن. خۆگەیاندنە چتێک بۆ تەماشا یا کڕینی و یان خواردن و یا بردنی. کەل و پەل بەگران کڕین. بە کۆمەڵە لەسەر چتێکی گردبوونەوە. ـــ ی مێش و مەگەز: هەڵنیشتن و دەورەلێدانی. ڕووتێکرنی مەردومێکی زۆر بۆسەر چتێک.

**پێوەهاتن:** پێوەچوونی خەلک بەبۆنەی خانووی تازە یا منداڵبوون و یا مردو لێمران و نەخۆشی و ئیترەوە.

**پێ و بەلەک:** پاو و پووز.

**پێ و پل:** لاق و لەتەن، پێ و ئەندام، قاچ و قول.

**پێووتن:** پێکوتن، پێگوتن.

**پێوور (باد.):** ئەستێرەی کۆ.

**پێوورچە:** گیایەکی کوێستانییە گەڵایەکانی وەکوو کاهوو وان وولاخ دەیخووا.

**پێووری:** پێوەری.

**پیووری (باک.):** بانگکردن.

**پێووشک:** پاووشک.

**پێوەشووێن:** شووێنی پێ، سۆراخ: شووێنهەڵگر، شووێن پێی دزەکەی هەڵگرت و چتە دزراوەکانی دۆزینەوە. براکەم گوم ببوو بە ـــ ی داچووم: بسۆراخیدا چووم.

**پێویا (باک.):** پێویست، پێداویست. (دەر.) بەی وایستن.

**پێویس:** پێویست.

**پێویست:** گەرێ، گەرەک، پێداویستە. پێویا. ئاوسەرکەم. ئارەزوو. ئاتاج، پێداویست.

**پێویستە:** گەرەکە، دەبی. پێدڤێ، (باد.) پێتڤی.

**پێویستن:** پەیوایستن، ئامانگوری بۆ چتێک.

**پێویستی:** ئاتاجی.

**پێهاتن:** پێگەیشتن، بەخۆداهاتن. ووتن، بەسەر زماندا هێنان. ددان پێدانان، درکاندن.

**پێهەڵبرین:** تاڵوکەکردن، خۆش ڕۆیشتن. دەست درێژی، پێ لێهەڵکێشان، شولێهەڵکیشان.

**پێهەڵپەرین:** گەیشتنی برینە بە یەکێک لە ئەندامان و لەشی مرۆڤ. لەشم برینی پێهەڵپەریوە.

**پێ هەڵچووندن:** پێ هەڵگەڕاندن.

**پێ هەڵچوون:** (فە.) وەگژچین. بەدار یا دیوار و یا جێگای بەرزدا هەڵگەڕان و چوونە سەر. پێ هەڵگەڕیان. هەڵگەڕان. (هەورا.) وورووستەی.

**پێ هەڵکلان:** تووک لێکردن، سنگ کوتان. نەخشەی خراپ لێدان.

**پێ هەڵکران (ڕەوا.):** بەسترانی تەنگە و بار.

**پێ هەڵکرندن:** پێ خوراندن. پێ سازکردن، پێ هەڵسووڕاندن.

**پێ هەڵکردن:** بەستنی تەنگە و یا تەنگەی باربەستن.

**پێ هەڵکوتن:** هەڵنان، بەتاناچوون، پێ هەڵگوتن، ستایشکردن، وەتاناچوون. (باک.) ئەڤراختن.

**پێ هەڵگەڕان:** بەدار و دیوار و جێگای بەرزدا چوونە سەر، پێهەڵچوون: ـــ ی مۆرانە.

**پێهەڵگەڕندن:** بەدار و دیوار و جێگای بەرزدا بردنەسەر، پێهەڵچوواندن.

**پێ هەڵگرتن:** ـــ ی منداڵ: دارەدارکردن. پێهەڵێنان، خۆش ڕۆیشتن، خێرا ڕۆیشتن.

**پێ هەڵێنان:** خۆش ڕۆیشتن. پێدرێژی، شورلێ هەڵکێشان.

**پێ هوورچە:** گیایەکی کوێستانییە گەڵایەکانی وەکوو گەڵای کاهوو پانە و ئاژاڵ دەیخووا.

**پێ هۆکێلان (هەورا.):** پێهەڵگەڕان، پێهەڵچوون.

**پێ هۆڵە (ڕۆژ.):** پاگێرە.

**پێی ئاش** (شار.): دارێکه له شێوەی پەرەقدایه سەرێکی بەخوانەکەوە نووساوە و سەرەکەی تریشی لەدەرەوەیە بەرداشی سەرەوەی پێ بەرز و نزم دەکرێت.

**پێ پیزە** (ڕەوا.): دینگه، پایه.

**پێ پێن**: لای خوارەوی چت.

**پێ** (هەورا.): پیو.

**پێ**: بەو، بەم: (هەورا.) تۆ ـ شیرینی: تۆ بەم شیرینییەی. شان، پایه، پێ. بەـ : بەپێی. وەشڵەی ـ کەسەی: خۆزگە بەو کەسەی. (هەورا.) پیو، پییه. (باد.) پووک.

پیبەر

**پیبەر**: بیبار.

**پیبک** (باک.): بەبەڵەی چاو، (باک.) پیبۆک. بیبیلەی چاو.

**پیبۆک** (باک.): بەبەڵەی چاو.

**پیپ**: بەرمیل، کوویەی دارین یا کانین.

**پیپک** (باک.): پڕکردن، داگرتن، ئاخنینەوە. لوولاکی لاقی، ئێسکی لوولاکی.

پیپ

**پیت** (موک.): (باک.) تیپ. کشتوکاڵی ئەمساڵ بەپیتە. فیت، ڕێژەن، پرشت، ڕێژەو، پیز، فەڕ. بەـ : برشتداره. بێـ : بێ برشته. (هەو.) هەفتەی پێنجەمینه لە هەشت هەفتەکانی زستانێ کەوتۆتە نێوانی ئۆخەن و پاڵۆزێ. (باد.) زیبک.

**پیتاک** (هەورا.، بابا.): خوەه، خووێک، سزا، سەرانە، مەکات، باربوو، مریشک و مەڕ و ڕۆن و دەغڵێکە ئاغایان لەجیاتی سەرانەی خۆیانی دەستێنن. کۆکردنەوەی چتەمەک یا پاره بۆ باربووکردنی یەکێکی. کۆکردنەوەی دراو لەلایەن چەند کەسێکەوە ، کە چتی پێ بکرن و بە هەموویان بیخۆن. پرویتی ناوماڵ.

**پیتاڵ**: وورده کەل و پەلی ژنانه.

**پیتوە** (ئەردە.): پاتاوە.

**پیتە** (مەر.): کای گاڵ، هەرزنی زۆر وورده، پووشی چەڵتووک وگاڵ (هەرزنی)یە. چێشتی گۆشتاو.

**پیتەبرە**: پیکەبرە. کرمێکی گچکەیه لەناو قەفی گەنم و جۆدا پەیدا دەبێ گرڵەکەی لەبنەرەتیدا دەقرتێنێ.

**پیتەپیتە**: ووردەوورده، کەمکەمە، وارەواره، ووسەووسه، بەشبەش.

**پیتەک** (باد.): پێچیک، چتێکی کەم. (ئەردە.) پیت، تیپ.

**پیتەچن**: تیپچن ئەو کەسەیە پیتەکانی چاپخانان دەزانی کوو بڵاوکاتەوە.

**پیتدانەوە**: خێردانەوە: فیتدانەوە.

**پیتدار**: بەبڕست، بەپیز.

**پیتک** (ئەردە.): پەڵەپیتکە. شوورەیی. (شێخان، ژەن.) پیک.

**پیتڵک**: پاک و خاوێن.

**پیتک خستن**: پەڵەپیتکە هاوێژتن.

**پیتۆ** (باک.): کرمن، کرم تێدراو، کرمدار، کرمێوون.

**پیتۆر** (خۆ.): پیتۆڵ.

**پیتووکە**: گیایەکە دەکرێتە گزرە بۆ ئاژاڵان.

**پیتۆڵ**: زۆرزان، بڵیمەت، فەیلەسووف. ووشیار، دووربین. بەهوورده، ڕامیاری، سیاسی. ـ ی: زۆرزانی، بڵیمەتی، ڕامیاری.

**پیچ** (ڕەوا.): کەم، نەخت. ـ یک: کەمێک، نەختێک. هیچ، هیچ وپووچ.

**پێچ**: بورغی. (زا.) بیچ. (باک.) بیژوو، زۆڵ.

**پیچەک** (باد.): کەمێک، نەختێک، تۆزێک.

**پیچ پیچ**: کەمکەم، تۆزەتۆزە.

**پیچ پیچە**: کەمکەمە، تۆزتۆزە، نەخت نەخت.

**پیچران**: پێچران.

**پیچرانەوە**: پێچرانەوە.

**پیچ ڕەزڵە**: ڕەزڵەپیچ، ڕیزەڵە. گیایەکە بەداران هەڵدەگەڕێ بەری وەکوو ترێیە لە دەباغیدا بەکاردەبرێ.

**پیچک** (هەورا.، بابا.): جوورەگیایەکە وەکوو پیازیی وایە دەخورێ یەک چڵە و سێ سووه ئامێزێک بڵند دەبێ گیایەکی کوورێستانییە دەکرێتە کەلانە. کفتەی ساواری بێ ئاو. (ئەردە.) گوڵوڵە، گڵۆڵە.

**پیچن**: دارێکە لەنێو کەلانە دەزووی دەنێن تا بی پێچن.

**پێچۆک** (باک.): پیچووکە، گیایەکە.

**پیچی** (باد.): پەنجەی دەست.

**پیچیاگ**: پێچراو.

**پیچیان**: پێچان.

**پیچیان بەیەکا**: پێچانەوە بە یەکدا.

**پیچیانەوە**: پێچانەوە.

**پێچیو**: پێچراو: کەمێک، تۆزێک، نەختێک.

**پیخ** (باک.): کەنار، دەوروبەر. ئێخە، بەرۆک.

**پیر**: زاڵ، ئاقسەر، کۆنەساڵ، بەتەمەن، سەرسپی، پۆرسپی، سەر، کاڵ، بەساڵداچوو، لەنێوەوەچوو، کەهل. ـ بوون: داکەوتن، سەربوون، بەساڵداچوون، قەرتبوون. بەسەری ـ ی یەوە . بەـ هوە چوون: چوونە پێشوازی. مرغ، پەیر، پیاوی زانار گەورەی ئاییني، ڕابەر. (سوور.، ڕۆژ.) نەنک، داپیر.

**پیراسه**: پاک و خاوێن کراوەوە.

**پیران**: ١) چیایەکە کەوتۆتە باکووری ڕۆژاوای ڕەواندزێوە. ٢) ناوی گوندێکییه. ٣) شێخ سەعیدی پیران قارەمانی کوردستان سەرۆکی کورد، کە لە ١٩٢٥ بەدەستی ترکان شەهیدکرا خەڵکی ئەو گوندەیه، کە لەژووری دیاربەکریدایە. ٤) نێوی هۆزێکی کوردە کەوتۆتە نێوانی لاجان و حاجی ئۆمەرانەوە. ٥) لەهۆش خۆچوون. نێوی نێرینانه. ٦) (ڕۆژ.) ناڵه، شەوه، بێهۆشییەکە تووشی منداڵ و ئافرەتان دێت. ـ ی بردنەوە: لەبەر خەم و پەژاره لەهۆش خۆچوون.

**پیراووه**: جووره دەرمانێکە لە پیو و لۆکە و قسڵ دروستدەکرێ و گونج و دیزه و گۆزەی کونی پێ پینەدەکرێ، پیو و لۆکە و قسڵی تازه پشکووتوو لەسەر ئاووری تێکەڵ یەکتری دەکرێن.

**پیرانن**: پرمەکردنی ئەسپ و ماین.

**پیرانشای** (هەر.): مەرمەڕشا، بلووری.

**پیرانن:** پیراندن. جووره دەنگێکە شوان بەدووی ئاژاڵاندا دەیکات وەکوو عاعا.

**پیرایەتی:** پیری، پیرێتی.

**پیرایی (ئەردە.):** بەپیرەوەچوون.

**پیرە:** لەڕووی واق وڕمانەوە بۆ چتی کۆن و پیر بەکاردەبرێ. پیرە چەقۆ، پیرەدار، پیرەئەسپ، پیرەئاو بەتەووژمە.

**پیرە (جز.):** پیرەژن.

**پیرە:** پرە، پرمە، دەنگی لووتی چارەوێیە. پیرەپیر.

**پیرەپنتک:** پیرپنتک. منداڵێکە کردار و گوفتاری لە پیاوی گەورە بچێ.

**پیرەپیر:** پیرێژن، پرمەپرمی یەک لەدوایییەک. کێشکی بزن و مەڕی کێوییە، کە دوژمنی دیت بەدەنگی پیرەپیر هەموویان ئاگادار دەکات و هەڵدێن.

**پیرەبابە:** باپیر. پیرپنتک. ناوی دێیەکییە لە ناوچەی شاربازێڕی.

**پیرە باوە:** گیایەکە وەکوو گوێز بەڵەیە بەڵام بنەکەی لەوی خڕترە، پەلکەکانی کوڵکن و تۆزاوییە بەکاڵی دەخورێ.

**پیرەبووک (باک.):** کەڵکەڵە.

**پیرەپیتۆن (ڕەوا.):** منداڵێکە ورتە و ئاخۆتنی پیرانی بێت، پنەپیتۆ، سەرەسۆدرە.

**پیرەدا (باک.):** نەنک، داپیر.

**پیرەزا:** منداڵێکە لەکاتی پیری بارکی یا دایکیدا لە دایکبووبێ.

**پیرەژن:** پیرێژن، (هەورا.) پیرەژەنی.

**پیرەسەگ:** سەگی پیر. بۆ جوێن بۆ مرۆڤانیش بەکاردەبرێت.

**پیرەک (باک.، بۆتا.):** ژنی بە مێرد. (جز.) پیرەژن. ژن و ماڵ و منداڵ، خێزان. چتی چرچ و کۆن وپیر.

**پیرەڵۆک:** داری پیری گەندەڵ. ئەندامێکە لەبەر زۆر مانەوەی لەناو ئاودا سپی پات و چرچ و هەڵپزاوبێ.

**پیرەمەرد:** پیرەمێرد.

**پیرەمەوەندی:** تیرەیەکی کوردە لە هۆزی داوودە، لە لێوای کەرکووک و سلێمانی دادەنیشن.

**پیرەمێر:** پیرەمێرد.

**پیرەمێرد:** پیرەمێر، کۆنە پیاو، پیاوی پیری بەناو ساڵاندا چوو. نازناوی هەستیار و ڕۆژنامەنووسێکی گرنگ بوو ناوی حاجی تەوفیق و خەڵکی سلێمانی بوو.

**پیرپەڵ:** مریشکی دەشتێ، مریشکە کێوی.

**پیرپیرۆشک (باد.):** جاڵجاڵووکە.

پیرپیرۆشک

**پیرخەلیلە (هەورا.):** پیرخەنیلە.

**پیرخەنی:** پیرخەنیلە.

**پیرخەنیلە:** چێشتێکە بە برنج یا ساواری وورد لێبنرێ. ئاردی ساواری، پیرنی، (هەورا.) پیرخەلیلە. سمیتک.

**پیرسۆز:** چتێکە وەکوو فانووسی، بەڵام لەباتی شووشە بلووری مێولێدراوی لێ دەپێچرێ و مۆمی تێهەڵدەکەن. پیسۆز.

**پیرعەبۆک (باد.):** جووره ئافرەتێکی زرتەبۆزی لەندەهۆری ناقۆڵای وایە، کە قژنێکی وابێ وە جانەوەران بچێ لە چیرۆکاندا زۆری لێدوراون.

**پیرعەفۆک:** جاڵجاڵووکە.

**پیرفازک (باک.):** گیایەکە.

**پیرقەلاچک (باک.):** گیایەکە.

**پیرک (باک.):** تایەک، مامان. نەنک. ژنی هۆشمەند. جاڵجاڵووکە.

**پیرکژین:** پشمە، دەنگی پشمین. پشمین.

**پیرلێکردن:** لێ پیرکردن وەکوو نەخۆشی، کە کۆن بی دەڵێن لێی پیرکردووە.

**پیرنی:** پیرخەنیلە.

**پیرۆ (بار.):** بارەبەر، دەوار، پێڕۆ، ووڵاخ، کەر، ئێستر، ئەسپ، ماین، چارەوا، چارەوێ.

**پیرۆت (باک.):** ناوی نێرینانە.

**پیرۆز:** بەفەر، بار، بەپیت، سپی ڕۆژ، خۆش، خۆشتان. ووشەیەکە بۆ جەژنە و جلکی تازە و خانوو بەکاردەبرێ بە پێچەوانەی شووم و نەگبەتی و بێ فەری و بەدفەریە. نێوی ئافرەتانیشە.

**پیرۆزانە:** چتێکە یەکێک بتداتێ لەکاتێکیدا، کە کاڵایەکی تازەی لەبەرکردبێ و یان بە پایەیەک گەیشتبێ لە بەرانبەر ئەوەدا، کە پێت گوتووە (پیرۆزت) بێ.

**پیرۆزە:** بەردێکی شینی نرخدارە بۆ نقیم وقاش و چتی تر بەکاردەبرێ. (موک.) باڵندەیێکیشە.

**پیرۆزبایی:** پیرۆزانە، جەژنە پیرۆزە.

**پیرۆزکاری:** پیرۆزکردن، پیرۆزباییکردن.

**پیرۆزی:** کوتنی (پیرۆزت بێ)یە بە یەکێک.

**پیرۆزی پەشین:** سەرکەوتنی دوایی.

**پیرۆژە:** بروانە: پیرۆزە.

**پیرۆک:** پیرەڵۆک.

**پیروکاڵ (باک.):** پیروجحێڵ.

**پیرومەردە (ڕەوا.):** چیکڵدانە تێکچوون.

**پیرهەفۆک (باک.):** وەهم، سورەتی خەیاڵی. تەونی جاڵجاڵووکە.

**پیری:** پیرایەتی، پیرێتی. بەرەوپیری، پێشوازی. ڕابەری، پێشەوایی.

**پیرێتی:** پیرایەتی.

**پیرێژن:** پیرەژن، کۆنەژن، قەرادە.

**پیرێزن:** پیرەپیر، کەرادە، پیرەژەنی.

**پیرێژنە سەرئەسنینە:** دەعبایەکە لە گچکەییدا بەقەد زچێک دەبێ و هێلانەی لەناو خۆڵێدا دروستدەکات.

**پیرێژنۆکە (کۆ.):** جاڵجاڵووکە.

**پیز (کف.):** لوولاک، پووز، بەلەک، نەرمەی لوولاکی پێیە. (باد.) کووزەلە (جووره گیایەکە).

**پیزپیزاک (باد.):** جووره چۆلەکەییکی کلاو درێژە.

**پیزپیزۆک** (باد.): گیایەکە نێرتکی هەیە، کە پاککرێ ناوکەکەی وەکوو لۆکە وایە.

**پیزڵ**: گیایەکی ناوی هەمیشەیی گەڵای وەک گەوەر وایە، ڕەگ و ریشەکەی دەکوترێ و گەرم دەکرێ لەبەر مووسڵدان دادەنرێ بۆ میزگیرانێ زۆرباشە.

**پیزۆک** (ڕۆژ.): بیرۆ.

**پیزۆکە**: زیپکەیێکی گچکەیە لە لەش دەردێ.

**پیزی** (ئەردە.): قوون، قنگ.

**پیژ** (باک.): کردەوەی زیاندەر. لەپشتەوە لێدان. تەلاش.

**پیژان**: بێژانەوە، دابێژتن (بۆ نارد و ئیتر). (باک.) گیایەکە.

**پیژەک** (باک.): گیایەکە.

**پیژپیژە**: سووک، نزم، بێ نرخ.

**پیژدێ** (باک.): گیایەکە منداڵان دەیچنن و ناوکەکەی دەخۆن.

**پیژگ** (باک.): گیایەکە، پیشۆک.

**پیس**: ناپاک، چەپەڵ، ناشوو، چڵکن. چەلەم، لیتۆکە، گلاو، ئاوەگڵ. گوڵ، دووزام. ــ بوون: هەرمین، لەوتین. ــ کردن: لەوتاندن، لەناوبرنی پاکی چتێک. هەڵنەهێنانی هێلکە و بۆگەنکردنی. بەد، گەند، خراو، خراپ، شێت، غەزناک.

**پیسار**: خووێن تێکەوتنی ژنان، بێ نوێژی، تێکەوتن.

**پیسایی**: پیسی، چەپەڵی، گەندی. ــ ی گیانلەبەران، گوو.

**پیسبوون**: چەپەڵبوون. ــ ی هێلکە: تێکچوونی هێلکە.

**پیسکردن**: چەپەڵکردن.

**پیسپیسۆک**: میزمیزک، شەرگەر، شەرگەرد، پەسپەسەکۆڵە. (ئەردە.) جاڵجاڵووکە.

**پیست** (باک.): توێژی سەربرینانە.

**پیستر**: چەپەڵتر.

**پیسزک**: پێرک، هەرزاڵ.

**پیسترین**: چەپەڵترین.

**پستووری** (باک.): بێدادی، زۆر، جەور.

**پیستێکلی** (باک.): پتر پێوەنان.

**پیسدوێن**: زمان پیس.

**پیسکە**: (ڕۆژ.) جلفڕ. چنچووز، پیسکێر، سەربڕ. جقیل، پووچ، ڕژد، چرووک.

**پیسکەڵە**: پیسکێر.

**پیسکەیی**: پیسکێری، پووچی، ڕژدی، چرووکی.

**پیسکردوو**: ڕژدکردوو، پووچکردوو.

**پیسکێر**: پیس و پەڵۆس، پیس و پۆخڵ، پیس و پەڵۆخ، پیسۆک، پیسکە، پیسک، پیسکەڵە. ــ ی: پیس و پەڵۆسی، پیس و پۆخڵی، پیسکەیی.

**پیسو** (زا.): بۆسۆ. پیسکە.

**پیس و پەڵۆس**: پیسکێر، چەلەم، پیس و پۆخڵ.

**پیس و پۆخڵ**: پیسکێر، پیس و پەڵۆس، ئاشوو.

**پیسۆر** (باک.): بێوەسیری.

**پیسۆز**: پیرسۆز.

**پیسۆک**: پیسکێر.

**پیسی**: پیسێتی، گەمار، گوو، پیسایی. گوڵی، دووزامی.

**پیسێتی**: نادروستی، سستی، ناتازایی.

**پیسێر** (ئامێ.): نێفەک.

**پیش** (زەن.، لو.): بۆر (.). گرفتاری. (موک.) ڕق، قین، کین، پشم، دڵتەنگی. ــ خوواردنەوە: ڕق خوواردنەوە. (باک.) کردەوەی زیاندەر.

**پیشان**: چتێک زۆر بکوڵێنرێ و بەهەڵمی خۆی بپشێنرێ یا لەژێر ئاووریدا. پشووسواربوون.

**پیشاندن**: چتێک لەژێر ئاووری یا لەناو هەڵمی خۆیدا پیشاندن و پوختەکردن.

**پیشانگ**: پێشاهەنگ، پێشرەو، پێشەوا.

**پیشانن**: پیشاندن. (ئەردە.) پڕماندنی وولاغ.

**پیشاو**: چتێکە وەکوو کرتۆپە (پەتاتە) کە بەهەڵمی خۆی پیشێنرابێ یا لەژێر ئاووریدا.

**پیشاوی**: پیشێنراوی.

**پیشە**: ١) کردار، کردەوە، دەستکر. کاری پێبژێو، فەرمان. ٢) خوو، ڕەفتار. هاو ــ: پیشەکەیی. هاو ــ یی: پێشکەپیتی. پشوو، دەم، هەناسە، نەفەس.

**پیشەخۆرە**: پیرۆزە. باڵندەیێکی ئێسکخۆرە.

**پیشەساز**: پیشەگەر، پیشەوەر. ــ ی: پیشەگەری، پیشەوەری.

**پیشەقان** (هەو.، خۆ.): پیشک.

**پیشەگەر**: پیشەکار، پیشەساز. پیشەوەر. کەسێکە کارێکی وا بزانێ، کە پێبژێ. ــ ی: پیشەسازی، پیشەوەری.

**پیشەناز**: پارچەکرێکە، کە لەپێش سفرە بەسەر ئەژنۆیاندا دەدرێت.

**پیشەوەر**: پیشەگەر، پیشەساز. ــ ی: پیشەگەری، پیشەسازی.

**پیشە و هونەر**: کردار و گزی و ئاکاری باش.

**پیشەی لووت**: کرکرۆچکەی کەپۆ.

**پیشخوواردنەوە**: بە دەست چتێکەوە دەستەلات نەبوون بۆ دەرپڕینی. خەمخوواردن، ڕق و قین قووتدانەوە، ئارامگرتن، ددان بە جەرگی خۆ داگرتن، خەفەت پەچنینەوە دڵ.

**پیشک**: ئامرازێکە کەنگر و چتی پێ هەڵدەقەنن. (بار.، باد.) ئارێتە، (خۆ.، هەو.) پیشەقان، (دەر.) بێڵەکان، (کە.) بێڵەقان. مەساسە. (هەو.) مرازێکی تەونییە. (باک.) داوێن.

**پیشەکان**: بێڵەکان.

**پیشکیشکانێ** (هەو.): جوورە گەمەیێکە.

**پیشکردن**: پیشخوواردنەوە.

**پیشلەک** (باک.): باڵندەیێکە.

**پیشن** (ئەردە.): کەسێکە هەمیشە پیشبخوواتەوە، ڕک ئەستوور.

**پیشنی** (فە.): ناوچاوان، پێشدەستی.

**پیشۆ**: چتێکە وەکوو لفکە تەختەکانی کەشتی پێ قایم دەکرێت.

**پیشوو** (زێ.): مێشوولە، پووشووە. پیفۆ، پیفگ.

**پیشۆک**: (هەورا.) پیفۆک. (کۆ.) تاڵەکۆک.

**پیشیاگ** (ئەردە.): پیشاو، برژاو لەژێر زیلەمۆیدا.

**پیشیان**: پیشان.

**پیشینی**: پێشینیان.

**پیف** (لو.): چتی پووتی پفهەڵدراو، سست، باکردوو.

**پیفە** (هەورا.): پیفۆک.

**پیفک**: پووشوو.

**پیفگ**: پووشوو، قاو.

**پیفۆ**: پیفگ، پووشوو، قاو.

**پیفوو**: پووشوو داری.

**پیفۆک**: کیفۆک. (جا.، هەورا.) پیشۆک، (بار.) پیزۆک، (دەر.) پوشک، (هەورا.کۆن) پیفە، (بۆتا.، باد.) پیڤۆک.

**پیفێ**: پووشوویداری.

**پیفیاگ**: چتی ئاوساو، چتی هەڵاّمساو. پووچ، ناووک گەند.

**پیفیان**: ئاوسان، هەڵاّمسان. پووچبوون، ناووک گەندبوون.

**پیڤ** (باک.): پەیڤ.

**پیڤاز** (باد.): پیواز. (باد.) ـــ ی: دۆڵمە، هەڵپێچراو. ڕەنگی پیوازی. چێشتێکە پڕ لە پیواز و گۆشتی قیمە دەکرێ.

**پیڤان** (باد.): پێوان.

**پیڤەدان** (باک.): پێوەدان، گەزتنی مار و ئیتر.

**پیڤۆک** (باک.): گوڵەمێخەکەی کێوی. پیڤۆنک.

**پیڤۆنک**: پیڤۆک، پیفۆک.

**پیق** (باک.) داری درێژ. (باد.) لوولاک، بەلەک بە ئێسک و گۆشتەوە.

**پیک**: (کۆ.) تووز، تێکوڵی دارییە، کە بە لوولە دەربهێنرێت، (بابا.) تووز. (هەورا.) قوڵینگی گەورەی بەردشکاندنێیە. ساز و ـــ: پیکی زوڕنا. ئەو چڵە لووسەیە، کە سەرێکی گوڵەگەنم یا جۆی پێوەیە وسەرێکیشی دەچێتە نێو قەفی هەرە سەرەوەی گوڵەگەنم یا گوڵەجۆیەکەوە، لە ۱۵ تا ۳۰ ڕۆژ پێش گوڵکردن چڵەکان وەکوو قەف لێکدەدرێن. (باک.) ـــ ی دووزەلە: فیقنە، بورجی چکۆڵە. (ئەردە.) چەکوچی قورسی گەورە، بە هەموو چتێکی درێژوکەو کون دەڵێن وەکوو پیکی زوڕنا و گوڵەگەنم وجۆ وئیتر.

**پیکە** (هەورا.، جا.): قامیشی چیغییە، کە باریک و ناو پتەوە.

**پیکەبڕە**: کرمێکە لە بنی پیکی گوڵی دەغڵی دەدات و ووشکی دەکات. پیتەبڕە.

**پێکردن**: بەزۆر کار و فرمانێک بە کەسێکی تر کردن. ئابڕووبردن، بەسەرداهاتن، سەرزەنشکران.

**پیکۆڵ**: بڕوانە: پێکۆڵ.

**پیکۆڵی** (باک.): پێکوڵی.

**پیل**: شان، قۆڵ، پەل. (باک.) ـــ ڕەش: جەرگ. ـــ سپی: سی، سیپەلاک. ڕان. ـــ ی بەرازی: ڕانی بەرازی.

**پیلاڤ** (باد.): پڵاو.

**پیلان**: پلان، فێڵ، فرڵداغ، دۆلاّب. کەین و بەین.

**پیلانباز**: فێڵباز. ـــ ی: فێڵبازی.

**پیلانساز**: پیلانباز. ـــ ی: پیلانبازی.

**پیلانگێڕ**: پیلانساز. ـــ ی: پیلانسازی.

**پیلانگێڕان**: پیلانسازی.

**پیلە**: کێشە، ووشتومر، مشتومڕ، شەڕ، دەمەقاڵە، دووگوورزە، بەربەرەکانی، داروگیر، (باک.) خرچۆک. مەرەکەمەرەک، خرەپیچک، (شەڕوبنار)، دەمەقرێ، دەمەتەقێ، بچەنگانێ. بەدمەستی. ـــ پێ گیران: قەگفزین. ـــ پێگرتن: بەربەرەکانی کردن، تێکگیران، مل لەبەرملنان، ڕاهشتن هەڤ. (ئەردە.) قۆزاخەی کرمی ئاوریشم.

**پیلەباز**: شەڕانی. ـــ ی: شەڕانێتی.

**پیلەوار** (شار.): بنەدارێکی ئەستووری نەقەڵەشراوە بۆ سووتاندنێ. (شار.) مووڕەدار. (هەورا.) پێلەوار.

**پیلەوەر** (باک.): تەنەکەچی.

**پیلک**: قامک، تپل. بووکێنی، ئەو دەستە کەسەیە، کە دەچن بووکێ بێنن. (باد.) پۆستەچی، چەپەرچی. ڕان، گەل، پۆل، بۆ منداڵان و باڵندان و ئاژاڵان بەکاردەبرێ. پوولەکەی زێڕە ژنان لە کڵاوپێچ و شووێنانی تری خۆیانی دەدروون.

**پیلکە**: تیلکردنی هەڵمەت بە پەنجە، بەتیر ئاویژتنی مەرمەڕ؛ ئازاد تیری ڕاستە.

**پیلوو**: قەپێلکی چاو، پەلکی چاو. (هەورا. ڕۆژ. کە.) پێلوو. (هەورا.) پێڵە، پەرە. (باک.) خلێف، پشتچاڤ، چمکێ چاڤ، پەلکی چاڤ. کۆپک، کۆپ.

**پیڵوو**: پیلوو.

**پیڵۆس**: مێمڵ، پەڵاس، بار، چەل و مەل، مووی دەماخی. خۆ لێ ـــ کردن: خۆلێکردنە بار، خۆبەسەردا کردنە پەڵاس، خۆ لێکردنە مێمڵ.

**پیم** (فە.، دەر.): پیو.

**پیمەنک**: دوونگی پشتی ووشترانە.

**پیمی** (هەورا.): پێوان.

**پین** (باک.): کولانەی مریشکان.

**پینار** (باک.): ئێلێکی کوردە لە ڕۆژاوای قامیشلووی.

**پینە**: (ڕۆژ.) پنیا. شاپینوز. (باک.) پەرەسپان، پەرەسپاندن. (باک.) پسپان، دۆن، پینەسۆل. پنج. (ئەردە.) کەژنە. کوڕی ئاپەوای ژنی بەمێردە. (باد.) کەپەک.

**پینەچی**: پینەکار، پینەدۆز.

**پینەدۆز**: پینەچی. ـــ ی: پینەچێتی.

**پینەساز**: پینەچی. ـــ ی: پینەچێتی.

**پینەسۆل** (باک.): پینەی کەوش.

**پینەک**: پینۆک.

**پینەکەر:** پینەچی.

**پینەکردن:** کەژنەکردن. پینە لە شوێنی دڕاوی جل و بەرگاندان. (هەورا.) پینەکەردەی. بریتیە لە بەسەرگرتنەوەی وتارێک بەلادانی بە جۆرێکی تر: ئازاد لە قسەی کوردێی دڵگیربوو، بەڵام چا بوو ئەویش زوو پینەیکرد.

**پینەگەر:** پینەکەر. ـ ی: پینەکەری.

**پینەگرتن** (فە.): سارێژ بوونی برین.

**پینەوپەرۆ:** پینا. ـــ کردن: جلکی شڕ پینەکردن. کاری سەخت و دژوار بەکەم و کورتی پێکهێنان.

**پینپینک** (باک.): چتێکە دابکەنرێ.

**پینج:** گۆشە. بێژوو، زۆڵ.

**پینجۆک** (باک.): گەمەی پێنج بەردانە.

**پینف** (باک.): ناوەخۆرە، بەرداخ، بادەی ئاوێ، بادی ئاوی.

**پینک:** (باک.) کولانەی مریشکان. کوخ. گەرد و ووردەی سماق و برنجییە.

**پینک کۆزەر:** ئەو دەنکە دەغلانەیە، کە دوای گیرە و کوتانی لە بێژنگدانی لە نێو کیف و قەپێلکەکانیاندا مابنەوە.

**پینلۆس:** (باد.) کولانی.

**پینگ** (ئەردە.): پیشخواردنەوە لە ڕقان.

**پینگاز:** هێلکەی گێچین، هێلکەیەکە لە گێچی دروستکرابێ.

**پینگانن:** پینگاندن.

**پینگاندن:** پینکبردنەوە، پینگخواردنەوە، پیشخواردنەوە لە ڕقان.

**پینۆک** (ڕۆژ.): وەنەوزە، خەوەکوتکێ.

**پینی:** کەپەک، بن بێژنگ.*

**پیو:** (ڕۆژ.) پیم. (دەر.) دوون، گوورزوو، (هەورا.) پی. بەزی تواوەیە. چەورییەکە، کە لە بەز و ناوزگی گیاندار بگیرێ.

**پیوار** (ئەردە.): پاشملە، پاشمەلە، لە نەدیوی، لە پاشەوە، لە پشتەوە.

**پیواز:** (دەر.، هەو.، هەورا.، زەن.) پیاز. (باک.) پیڤاز. لەناو خۆشناوەتیدا سێ جاران دەچێنرێ. ۱) کە تۆوەکەی چێنرا دەبێتە خسکە(قسکە) بەلان، کە زەوییەکەی باش بێ بەیەکجاری دەبێتە سەلک. ۲) قیسکەی دەچێنن دەبێتە سەلکی ناوەنجی، کە پێیدەڵێن: (دەق). ۳) دەقی دەچێنن دەبێتە سەلکە پیواز.

**پیوازاو:** ئاوپیواز.

**پیوازی:** (باک.) پیڤازی. ڕەنگی پیوازی.

**پیوان:** پێمان، پێماین. (باک.) پیڤان. ئەندازەی هەرچتێکی بگیرێ وەکوو دەغڵ و دان و زەوی و شلەمەنی ـــ ی پێدەڵێن.

**پیوە:** پووشوو.

**پی یە** (لو.): پیو، بەزی ناوزگی ئاژەڵ و مالاتانە، کە بە ئاوور تواببێتەوە، پاڵێورابێ، گۆشت و چزیلکی پێوە نەمابێ.

**پییۆک** (باد.): پیڤۆک.

**پییەک** (یەز.): ئاها، هاها بۆواق وورمانە.

**پێلینگان** (هەو.): لای پێیان، بە پێچەوانەی سەرینگانە. بەردێکە لەناو گۆڕیچەدا لەلای پێیانەوە دادەنرێت.

**ت:** تیپێکی ئابێی کوردییە. ڕاناوی کەسی تاکی ئامادەی دووەمە: دایکت، کاکت، پەرتووکەکەت، نامەکەت. (دەرس.) تۆ، تە، ئەتۆ بۆ (نێرانە). تیا: تۆ، تە، ئەتۆ بۆ (مێیانە).

**تا:** هەرتا، تاکە، هەتا، دا، تاکوو، هەتاکوو، تاکی، داکوو، (باک.) ئاڤداک، ئاڤدا. تاهەی لە خوواردن و خوواردنەوە بێ نیاز نابی، زمانت شیرین بێ تا بەڕێز و خۆشەویست بی. (باک.) نۆبەتێ، پەرتاف. (کرما.) تێ. (هەورا.) پاو. تەو، سەقە، گرانەتا. (باک.) گیشە، کۆم، پارت. مەلۆ، تایە. (مەرج) کە دوو چتان پێکەوە دەبەستێتەوە: تا ژیر و نیشتمان پەروەربی خۆشم دەوێی و سەرت بۆ شۆڕدەکەم، واتە خۆشەویستییت بەستراوە بە ژیریت. لابارێک، لنگەبارێک، بەندەک. تایەک ترێ: سەوەتەیەک ترێ و میوە، تابار. لا، پەلە، پەڕە، لاپەڕە. داو، هەودا، تاڵ(دەزوو، موو، بەن). بۆ ئەمەی: با گیان و لەشمان بکەینە قوربانی گەل و نیشتمان تا دوای ئێمە ناومان بەرز ئەبێ. ـــ کردن: پێچانەوە، قەدکردن. تاک، تاق، تەنیا، تەنها، دانە، تاقانە. ـــ لە زاری هاتەدەرێ من گەیشتمە لای. (باک.) شەتڵ، نەمام. بنچینە، ڕەچەڵەک، ڕەگ و ڕیشە. شان، پایە، جفت، جوور، لف، لنگە. هاوتا: هاوشان، هاوپلە. بێ هاوتا: بێ هاوشانە، بێ هەڤالە، بێ وێنەیە. (باک.) لکی داران. هەودا. نهۆم، چینی خانووان. ئارامگە، گۆڕ. دوایی و کۆتایی چتێک نیشاندەدات، ئەمن تەنها تا سەردەشت چووم، کە زێد و نیشتمانی زەردەشت پێغەمبەرییە، واتا پلەی هەرەدوایی چوونم تەنها سەردەشت بوو. تای تەرازوو، لنگە تەرازوو، پەلە، پەللە.

**تائیمە** (ئەردە.): هەتا ئێستا.

**تائێستا:** هەتا ئێستا، تانهۆ.

**تاب:** تاو، توانایی، پرزە، هێز، تین.

**تابار:** تا، لنگەبار، بەندەک، تاقە یەک فەردە، لنگەبارێکە بخرێتە سەرپشتی وولاغ.

**تابان:** تروسکەدەر، ڕۆشناییدەر. درەخشان. نێوی ئافرەتانە. گردێکە لە باشووری(حەسیکە) ی گردی تابان لە جزیرێدا ناودارە.

**تابەرەگلگل:** چتێکی خڕی تەنکی لووسە منداڵان لەسەرشان تلۆری دەکەنەوە.

**تابەنی** (ئەردە.): تەبەندی پەرتووک. بندروون و شیرازەی پەرتووکان.

**تابر:** بەن یا کەمە ئاوێکەنزا(دوعا)ی لەسەر خوێندرابێ، کشتەک. گەنەگەنە، دەرمانی سولفاتە.

**تابگە:** شوێنێکی تایبەتییە لە قەراخ ڕووبار و زێ و دەریایاندا، کە کەشتی تێدا ڕادەوەستێ.

**تابلە:** تاڵبەکی.

**تابووت**: دارەباس، داربـاس، (بـاک.) دارمـووق، سـەرەجە. (بـاک.) داربەشی، داروبەست. (جا.، هەورا.) دارتـەرم. داربەست، دارەبەست. (هەورا.) دارەبازە، لە تەختە و داران دروستـدەکرێ مردووی تێدا دەبەنە سەرگۆڕستانێ.

**تابوور**: فەوج، دەستەیەکی لەشکرییە، کە هەزار کەس دەبێت.

**تابووق**: خشت، کەرپووچ. (باک.) قەرمیت.

**تابوون**: داروودەسـت، تـابین. تـابوور (لـەشکر). (ئـەردە.) دوولابـوون، چەمانەوە، چەمیانەوە.

**تابی** (باک.): کۆزک، چەپەر. خەندەک، سەنگەر.

**تابیە**: مەتەرێز، سەنگەر، سووپەر.

**تابێتی**: تایبەتی، تایبەتی، تایەکاری.

**تاپاز** (ئەردە.): لەندەهۆر، زەلام.

**تاپاڵ** (ئەردە.): هەرپشە، هەشەکە، گاڵە.

**تاپان** (باک.): لوولدان، پێچانەوە. پێی ووشتری.

**تاپڕ**: تفەنگی جووت لوولە و حەوت لوولەی ڕاوێییە.

**تاپۆ**: تارمایی چت. دەزگایەکی دەوڵەتییە سامانان تۆمار دەکات. جوورە قەباڵـەییێکی دەوڵەتییـە دەدرێ بـە خـاوەند زەوی و خانووبـەرە، بنچـاخ، تاچک، قەواڵە، تووێڵ.

**تاپوو**: تاپۆ، تووێڵ. (ئەردە.) تارمایی، ناسوو، ڕەشانک.

**تاپی** (باک.): تاپۆ.

**تات**: هۆزێکی کوردە لـە نزیـک دیاربەکرێیـە. عـەرەب، (سوو.) تـاتک، حارەب، ئارەو، تات. (کۆ.) خوشک. (بابا.) کچێکە ئێسکێک یا پلە گۆشتێکی لە زێ (ئەندامی شـەرم) ی دابـێ. (هـەورا.) تـەخت. تاتـە بەردی لووس، بەردە پان، تەختەبەرد، حـەلان، بـەردی پـان و درێژ، کە لە قەراخ ئاوان دادەنرێ بۆ نوێژێ، تـەرت، سـەلبەند، فـەرش، سو، زرالات، کانگێر. (هەورا.) هیم، بەردەغا، تاس، (دەر.) تێت، تەڵـە بـەردی پـانی درێـژ، (بـاک.) تـەهت. (بـاک.) دەسـت نیشـانکردن، ناولێهێنـان، نیشانەکردنی کچێک. (ئەردە.) سفت، پتەو.

**تاتا**: تاڵتاڵ، داوداو، هەوداهەودا. (لو.) مام.

**تاتار**: نقشەک ژترکێ مغۆلن.

**تاتاڵە** (کە.، ڕۆژ.): کۆتەرە، سەری کۆڵەکە.

**تاتە**: (هەورا.) بـاب، بـاوک. دیـدە، خوشـکی گـەورە، (ڕۆژ.، دەر.، هەورا.) دێدە. (هەورا.، ئەردە.) نۆکـەری پیـر. (ئـەردە.) بـاوکی شیری. مێردی ژنێکی مـەمک تایەنە، کە بۆ منداڵـەکـەی بـەخێوی دەکات دەبێتـە تاتە.

**تاتەبەرد**: تات، لات، تا، بەردی تەنکی پان و گەورەیە.

**تاتەشۆر**: تەختەیێکـە مردووی لـەسـەر دەشۆرێ. (هـەورا.) تەختەشـۆر. پاشۆر. مەشفەن، مەغشەن.

**تاتزا** (شوا.): ئامۆزا.

**تاتک**: (سوور.) حارەب، ئارەو، تات. زمانی ئارەوی. (فـە.، شـوا.) مام، مـەمو. (کۆ.) دێـدە، خوشـکی گـەورە. (باک.) داپۆشـراو. بـرای باب، ئاپ. (باک.) تـەختک، تاتەبەرد. بـەردێکی پانـە لـەنێو خاکیدا و هێندێکی لە دەرەوەیە، دبێژن: مە ساقاری خووە لسەر تاتێ کوتایە.

**تاتکزا**: ئامۆزا.

**تاتۆ** (هەورا.): باوک.

**تاتووڵە** (ئەردە.): زار خوواربوون.

**تاتی** (ئـەردە.): سـەر و ژێر و بـۆر. (بـاک.) زمـانی ئـارەوی، ئـەزمانێ عارەبی. (هەو.، هەر.) لباد، نمەد.

**تاتیزۆک** (باک.): گەردەلوولە.

**تاتی کردن** (هەو.): وەسەرپێکەوتنی منداڵی بچووکە و ڕۆیشتنی.

**تاتی هەستی** (باد.): لبادگێران بە لوولدراوی لە کارگەدا.

**تـاج**: تـاجی پادشـایان، کـڵاوی مـیر و خونکارانـە. تـانج، زەرگـەنج، سەرتاج. چتێکی گچکەیـە لەوێنـەی تـاجی لـە پـەڕۆ دەچنرێ یا لـە کـان دروستـدەکرێ سـەرکردان لـەسـەر شانیانی دەدروون. تاجی گوڵان. (باک.) ـــ دانـان: تاج دانین.

تاج

**تاج خوڕووس**: جوورە ترێیـەکی سووری گلـوو خـووار و خێچـە وەپۆپـەی کەڵەباب دەچێ. جوورە گوڵێکی سوورە وەکوو پۆپەی کەڵەبابی وایە گوڵە تەدیفەی پێدەڵێن.

**تاجدار**: تانجدار. ـــ ی: تانجداری.

**تاجی**: (دەر.، هەورا.) تانجی. تاژی. (بـاک.) بۆنجی. جوورەسـەگێکی باریک و درێژ و ناوقەد باریک و کلک ڕووتە بۆ ڕاوی بـەکاردەبرێ، پاسی پێ ناکرێ چوونکوو ناوەڕێت.

**تاجی باڵندان** (باک.): بۆ و بۆچک.

**تاجی کەلەباب**: پۆپە.

**تاچک** (ئەردە.): بنچاخ، قۆچان. تاچەن، تاچەند، تاچەندی.

**تاچەند**: هەتاچەند، تاکەی، تاکەینێ، تاکەنگی، تا چ ئەندازە.

**تاچک** (ئەردە.): بنجاخ، تاپۆ، قەواڵە.

**تاخنای** (هەورا.): دەلاندن. ناو: ناودەلاندنی دیزەوگۆزە چتی گڵی تازە.

**تاخیک**: بێگانە، بیانی، تەنها کوردنەبی ئیتر لە هەر نەتەوەیێکی بێ.

**تـاخ** (باک.): گـەرەک، تـار. تاخـە، دسـتەوباقەیێک لەگـەڵای تووتـن ونیتر.

**تاخە**: پاکەت، بەستە، باقەیەک لەگەڵای تووتـن وچتی تر، (باک.) تاخ ـــ کردن: تووتن لەسەریەکتری دانان بۆ ووشک کردنەوە.

**تاخچە** (هەو.): ڕفحە.

**تاخستن**: نیشتنی خڵتەی شلەمەنی.

**تاخک** (باک.): باقە یا دەسکێکی گچکە لە گەڵای تووتن و نیتر.

**تاخم** (بـاک.): دەسـتە، کۆمەڵـە، دەرزەن، بەستەی چت، تـاقم، یادەستە جل وبەرگ. تاخمی کورسی ومێزان.

**تـاخورک**: جوورە عەرەبانـەیێکی قوقـزی بـێ پێچکەیـە بەسـەر بـەفریدا ڕادەکێشرێ.

**تـاخووگ** (ڕۆژ.): پـاخێل. گالیســکەی ســەربەفری، عەرەبانــەی سەربەفری.

**تادار:** نۆبەتێدار، (بار.) تاویی. ـــ ی: نۆبەتی داری، (بار.) تاویداری.

**تادەرگا:** لادەرگا، لنگەدەرگا.

**تادەرهاووردن:** بنکوڵی، وێکەوتن.

**تادەست** (ڕۆژ.): لاوێچ، لاگوێل. (ڕۆژ.) گوڵمێکی پڕ بەدەستی، چەنگێک، چنگێک.

**تادەستاڕ** (ڕۆژ.): لنگەدەستاڕ.

**تار:** ڕەواو، ڕەواوە، ڕەبابە، مرازێکە لە کەرەستەی شایلۆغان (مۆسیقا) وەکوو کەمانجە لێدەدرێ و دەنگی خۆشە. (موک.) تاریک، تنووک، وێل، هەترە، زۆر تاریک و ڕەش. ڕەش، تاڵ. تان: تاروپۆ: تان وپۆ، بەرانبەری پۆ. (کە.) کار. (باک.) گەڕەک. جەغز، دائرە، ئاڵقە. سەوزی، سەبزی. ژمێریاری پێنج ڕۆژانە لەنێوانی زستان وبەهارێدا، پێنجەی تار. تاڵ، داو، هەودایەک دەزوو. نان. (دەر.) هەڵە، تەرە، ئاوارە، ڕەو. ـــ بوون: هەترەبوون، ڕەوین. ـــ بوونەوە: بڵاو و پەرێشان بوونەوە. ـــ نان: ڕامالین، هەترەکردن. (هەورا.) تارمایی، تارم. (کە.، ڕۆژ.) جەندە خەون، تامۆرایی. (بۆتا.) سامۆتک، ڕەشانگ، ڕەشکی شێڤی. ـــ ی مردووان: خێو، مێردەزمە. تاراو، گیاندارێکە تەرەبووبێ. (باک.) کەوەی دەوری هێڵەگ و بێژینگ و ئیتر. کەڵلەی بێژنگ و هێڵەگ و ئیتر. چووارچێوە، پەرواز.

**تارا:** پەردەیێکی تەنک و ناسک و جووان و ڕەنگینی ئاوریشمییە بەسەربووکێیدا دەدەن لەکاتی گووێزتنەوەیدا. نێوی ئافرەتانیشە، دیواخ.

**تاراج:** تالان.

**تاران:** ڕەوین، تاربوون.

**تاراندن:** ڕاونان، تەراندن، تارنیان، ڕەمانن، ڕەواندن.

**تارانن:** تاراندن.

**تارانی:** جوورە دراوێکی زیوینی ئێرانییە.

**تاراو:** هەڵە و ئاوارە، هەڵاتوو.

**تارەدووا** (ئەردە.): تەرەدووا.

**تارەک** (باک.): یەک (تارە)، واتا یەک کەوە، یەک چەمبەری دەوری هێڵەگ یا بێژنگ وئیتر.

**تاربارێ** (باک.): بەیانی، کاتی تاریک و ڕوونی بەیانی.

**تاربوون:** هەڵە و ئاوارەبوون، هەتڵەبوون، هەترەبوون، تەرەبوون.

**تارچی** (باد.): کەسێکە، کە چتێکی بەش بکات، دابەشکار، دابەشەر، دابەشێن، بەشێنەر. تارژەن، تارلێدەر.

**تارژەن:** کەسێکە تار باش لێبدات.

**تارستان** (باک.): تاریک.

**تارشە:** پەیامبەر، پۆستە، چەپەر.

**تارک** (باک.): گچکەی (تار) ییە.

**تارکردن:** تەرەکردن، هەتلە و ئاوارەکردن.

**تارکرن:** تارکردن.

**تارگان** (زا.): جوورە گەنمێکی خراپە.

**تارم:** (کە.) خەرمانێکی هەڵدراوەوەیە بە دووای کوتانی، بەڵان هێشتا شەنبا نەکرابێ. (ڕۆژ.) تارمە. (هەورا.) تارمایی، تاریکایی، تاریکی. (ئەردە.) بەرهەیوان، جەلەب. چادر، تارمە، خەرگا، خێوەت. گومبەزە، تاق، گومبەت، قوبە. بڕ، دەست، جەڵەب. دەستەسووار، مێگەل. کپر، داڵووت، تارمە، کوخێکە یا چارداخێکە لە دار و شووڵک و چڕپی دروستکرابێ.

**تارمایی:** (بۆتا.) ڕەشانگ، ڕەشکێ شێڤێ. ڕەشایی، تاپوو، ئاسوو. ـــ چاوان: تاریکایی چاوان. ـــ مردووان: خێو، مێردەزمە.

**تارمە:** (کە.) تارم. کۆمەڵە دەغڵێکە گێرە کرابێ، بەڵان هێشتا بەبا نەکرابێ. (خۆ.) هووردە خەرمانێکە بۆ جاری چووارەم، کە خڕکرێتەوە سەریەکتری و گێرەکرێ. پتری گووێسووانانە، کە کەمێک یا زۆر بۆ لای حەوشی یا دەرەوە تێپەڕبووبێ. هەیوانی پێش باڵەخانانە. (باک.) بەریانک، بەرکۆشک. دوویانکۆک، بانیژە. تارودمبەک. کورسی. ـــ ی دەوری پلیکان و شووێنانی تر. دەراڤۆک، سینج.

**تارمی:** شەوەکە، گومبەز، تاق، سەراپەردە، ماڵ و چارداخێکە لە شووڵک و چڕپی دروستکرابێ.

**تارنان:** ڕاونان، ڕەپێنان.

**تارنیان:** تاونیان، ڕاونان، ڕاونیان، تەرەدوونیان، شوون نیان، شوونارژیین، ڕامالین، ڕماڵنیان.

**تارۆ** (باک.): ناوی نێرینانە.

**تاروپۆ:** تان. تان و پۆ.

**تارودمبەک:** تار و دمبک.

**تارومار:** ڕمیان، تەفروتوون، داغان. وێران، کاوول، کامباخ، پەخش و بڵاو. هەڵە، هەترە، پەرش و بڵاوبوونی چت. کاوولکردن، دەربەدەرکردن، تەفروتووناکردن. ـــ کردن: بڵاوەپێکردن. ـــ بوون: وێران و هەڵەبوون.

**تاری** (باک.): تاریک.

**تاریاگ:** تاراو، هەتڵە، هەترەکراو.

**تاریتۆسک:** تاڵیتۆسک.

**تاریتی** (باک.): تاریکی.

**تاریک:** تنووک، تنۆک، نووتەک. (باک.) تاری، تارستان، ڕەشەگەوور. (هەورا.) تار. جێگایەکە، کە ڕووناک نەبێ.

**تاریکیی:** (دەر.) تاریکی، تێریکایی.

**تاریکە:** تاریکایی.

**تاریکەشەو:** هەیڤ بڕەش، شەوەزەنگ.

تاریک وڕوون

**تاریک داهاتن:** پەیدابوونی تاریکی، بەسەرداهاتنی تاریکی دووای ڕۆژاوایە.

**تاریک و ڕوون:** ـــ ی بەیانی. تاریکەوور، تاریکەوورک. تاریک و لێل. تاریکی کۆتایی شەو، کە لەگەل ڕووناکی بەیانیدا تێکەل دەبێ یان ڕووناکی دووایی ڕۆژێ، کە لەگەل تاریکایی شەوێ تێکەل دەبێ.

**تاریک و لێل:** تاریک و ڕوون.

**تاریک ونووتەک:** زۆر تاریک، شووێنی زۆرزۆر تاریک.

**تاریکی:** نووتەکی، (باک.) تاریکایی، تاریتی، شووێنی تاریک، نەمانی ڕووناکی. (باد.) دوورزمان.

**تاریگان** (باک.): جوورە گەغێکە.

**تاریکەوور** (باک.): بەیانی. (باک.) تاریکەوورک. تاریک و ڕوونی بەیانی.

**تاریکەوورک** (باک.): بەیانی. تاریک و ڕوونی بەیانی.

**تارینەر** (باک.): دوودڵ، نیگەران. دڵپیس.

**تارینێری** (باک.): دوودڵی، نیگەرانی. دڵپیسی.

**تازە:** نوو، نووێ، نەو، نڤار، نفت. نووچە. ــ بوونەوە: نووێبوونەوە. ــ کەرەوە: نووێکەرەوە. ــ کردنەوە: نووێکردنەوە. ناوی ئافرەتانیشە. (باد.) جووان، ڕند.

**تازەبەتازە:** خواردەمەنیەکە لەگەڵ پێگەیشتنی بخورێ. میوە ــ خۆشە.

**تازەبرین:** مەبەس لە کەسێکییە، کە تازە مردوویەکی لێ مردبێ.

**تازەپەیدابوو:** تازەپەیدابووگ، تازەداهاتوو. چلەدار. منداڵی ساوا.

**تازەپیاکەوتوو:** مەبەس لە کەسێکییە، کە لە پاش هەژاری دەوڵەمەند بووبێ.

**تازەپێگەیشتوو:** نەودەم، دەمڕووت.

**تازە داهاتوو:** تازەداهاتگ.

**تازەزاوا:** زاوا لە مانگی هەنگویندا.

**تازەقەڵا** (ڕۆژ.): ناشی، نابەڵەد، کەسێکە تازە دەستی بەکارێکی کردبێ و هێشتا تێیدا ڕام و لێهاتوو نەبووبێ. چتی تازەداهاتوو.

**تازەکۆکە:** ئێستا ،ڕێستا.

**تازەکردنەوە:** نووێکردنەوەی چتی کۆن.

**تازەگی:** بەتازەیی، چتی تازەی نووێ، تازەیی.

**تازەیی:** نووێیی، نڤاری.

**تازێ** (زا.): ڕووت و قووت.

**تازی:** (باک.) فێنک، سارد. ئاڤەکە تازی یا تەزی، ناوی فێنک و سارد. (ڕەوا.) خاو، کاڵ، نەکوڵاو، ڕووت، قووت، کۆن. (باک.) ڕووس. ئارەوی یا عارەبی. تازیە: پرسە، تازیەداری، تازیانە. (باک.) بنهاری.

**تازیەخانە:** شیوەنگا، شین و شەپۆڕگا، شینگا.

**تازیتی** (باک.): ڕووتێتی.

**تازیر** (باک.): بەسەر ڕۆیشتن، سەرکۆنەیی. ــ کرن: سەرکۆنەیی کردن، بەسەرداهاتن.

**تازیلە:** توورەکەیێکە دژی تیری داندۆکی تێدا هەڵدەگیرێ. برۆیش. تازیە. گەڤێکە لە دەستاڕکرابێ، برۆیشی گەرمێنێ. چێشتێکیشە بەو گەڤە لێنرابێ.

**تازیمانە:** تازیە، (باک.) بنهاری.

**تاژانگ** (باک.): قامچی.

**تاژدکۆ** (باک.): ناوی مرۆیانە (پیاو).

**تاژی:** تاجی، تانجی، (باک.) کاژی.

**تاس:** (یەز.) کێشێکە بریتییە لە ئامانێکی وەکوو ڕبە، ڕۆن و دۆشاو و دانەوێڵە و چتی تری پێ دەپێون بۆ کڕین و فرۆشتن، کە پێنج یەکی تەنەکەیەکییە. کاسە، ئاوەخۆرە، تەرار. قاپ، ئامان. تاسی ئاو خواردنەوەی. کاس، سەرمسووڕە، واق ووڕی. (هەو.) ــ ی سەری ژنان: جوورە خشڵێکی سەری ژنانە، لەسەرفیسی تاسی دروست دەکەن لە زێڕ یا لە زیوی ڕیشوشی پێوەیە. ئێڤسەرک. (ئەردە.) پەیران، فەرقان. پشووسوواری، تەنگەنەفەسی. گەرووخڕە. بێ مەو، سەری بێ مەو، سەرتاووسی. مۆرەی نەردێنی.

**تاسا:** کاس بوو، واق ووڕما.

**تاسان** (هەورا.، ڕۆژ.، موک.): کاسبوون، واق ووڕمان. تەواسان، بێ هەست و مات بوون. هەناسە لێبڕان. خنکان.

**تاساندن:** کاسکردن، واق ووڕکردن، تەواساندن، بێ هەست و مات کردن، دەست لە تینتینۆکەنان وهەناسەبڕین بە چەشنێکی وا کە بخنکێ یا نیوەخنکاو بێ. خنکاندن.

**تاسنراو:** کاس، واق ووڕماو. خنکاو.

**تاسانن:** بڕوانە: تاساندن.

**تاساو:** کاس، بێ هەست، بێ هۆش. مات، واق ووڕماو، هەناسەبڕاو.

**تاسایی:** کاسی، بێ هۆشی.

**تاسە:** یاد، بیرەوەری، ئارەزوو، هەوەس، (کە.) کەووژ، ئەلها. بەداووداڵ، دڵخواز، کەڵکەڵە، پەژارە. ــ کردن: یاد و ئارەزووکردن. ــ ی پیری: ئارەزوو و بیرەوەری پیری. پەژارەی پیری.

**تاسەخووار:** کەسێکە تاسە و ئارەزووی یەکێکی بکات. ئارەزوومەند.

**تاسەخۆر:** ئارەزووخۆر.

**تاسەدار:** ئارەزوومەند، بەداووداڵ. ــ ی: ئارەزوومەندی.

**تاسەر:** هەتاسەر، هەتاهەتایە، هەمیشە.

**تاسەکردن:** یادکردن، ئارەزووکردن، بیرەوەری کردن.

**تاسەمەند:** تاسەخووار.

**تاسەوی:** بەرچنەی گەورەی ترێ.

**تاسب** (هەو.، خۆ.): دوژمن، نەیار، ناحەز. نەیارێکە لە کەمیندا بێ، پیشکەپێ. چاولێکەر.

**تاس بەسەرداهاتن:** تاس بردنەوە.

**تاس بردنەوە:** واقمانێکە بەسەر مرۆڤاندا دێت لە کاتی بیستن یا دیتنی چتێکی سەیردا.

**تاسبی:** دوژمنی، ناحەزی، نەیاری. دوژمنایەتی. چاولێکەری، پیشکەپیتی.

**تاسک** (باک.): پیاڵەی گچکەی ئاو خواردنەوە. تاسی چکۆڵە.

**تاسکەباب:** قابلەمەی چێشتی تاسکەبابییە.

**تاسکەبابی:** چێشتێکە بریتییە لە گۆشتی سوورکراوەوە بە پیواز و تەماتە و لیمۆ و بەهاراتەوە دروست دەکرێ.

**تاسکەچەڵە** (هەورا.): سیسارکە کەچەڵە.

**تاسکەوو:** تاسکەباب، قاوڵەمە. قابلەمە شۆرباوی گۆشتی بە لیمۆ یا بە قۆرە.

**تاسکردن:** تاسان. (ئەردە.) گەرووەخڕەگرتن، تەنگەنەفەس بوون، پشووسووار بوون.

**تاسکڵاو:** جوورە کڵاوێکی ژنانەی سابلاخییە، کە بە خەیاتە و ئاوریشم گەلێک نەخش و نیگار و گوڵی جووانی لێدەکرا. کڵاوزێ، جوورە کڵاوێکی پۆڵاییینە لەکاتی جەنگێدا لە سەر دەنرێ.

**تاسمە:** (ڕۆژ.) پارچە زەوییەکی کشتوکاڵی گچکەیە. (بابا.) بەلەچەک.

**تاسنای** (هەورا.): تاساندن.

**تاسواس** (باک.): خەمخۆری.

**تاس و تەبەق:** خشڵ و چەک و زیوەری ژنان.

**تاسووخ:** (ڕۆژ.) ئارەزووی دیدار، ئارەزوومەندی. ئارەزووکراو، کەمیاب، نایاب.

**تاسووق:** تاسووخ، خواردەمەنییێکی زۆر خۆش و نایابە، کە کەم دەستکەوێ.

**تاسوولقە** (دزە.): سووالەت.

**تاسوولکە:** تاسی گچکە.

**تاس و لووس:** لووس و پووس. خۆ ــ دان: خۆتاسدان، دەست بەخۆدا هێنان. ــ کردن: لووس و پووسکردن.

**تاسیان** (ئەردە.): خنکان، خەفەبوون.

**تاسیای** (هەورا.): خنکان، خەفەبوون.

**تاسین:** تاسان.

**تاش** (هەورا.، ڕۆژ.): گاشە. شمشێرەی کێوان، تیشە بەردی کێوان. تات، تاتەبەردی زل و پان. تاشینە بۆ بکەر بەکاردەبرێ بەلاّن بەتەنێ نا بەڵکوو ئاوا: سەرتاش، ڕیشتاش، بەردتاش.

**تاشا:** تەماشا. ــ کردن: تەماشاکردن.

**تاشای:** تراشین، تاشین.

**تاشەتەوەنی** (هەورا.): تاتەبەرد.

**تاشەر:** بازرگان. بەردتاش.

**تاشەی کوچک:** تەختە بەردی گچکە.

**تاشت** (بۆتا.): چێشتی سبەینانە.

**تاشتەی** (هەورا.): تاشین، تراشین.

**تاشتی** (باک.): خواردنی بەیانیانە. بەرتێشت، بەرچا.

**تاشتێ** (باک.): خواردنی سبەینانە.

**تاشران:** (هەورا.) تاشیا.

**تاشراو:** تراشراو.

**تاشین:** کرووزکرن، تەراشتن. تەلاشتن، تراشکردن، ڕەوارتن. تراشین، ڕێکخستن و لووسکردنی چتێک بە گوێزان. پاچین، هەڵپاچین. دادانی پێنووس. برین، درووێنەکردنی دەغڵ و گژ و گیا و ئیتر. داررووشاندن. ڕووتاندنەوەی چەرم لە تووک و موو.

**تاف** (جا.، هەورا.، ڕۆژ.): پرژ، تاڤگە، ئاوشار. ئاوێکە لە بڵندییەوە بەلافاو بڕژێتە خووارەوە. هەڕەت، چەنگە، دەم، سەردەم. ــ ی پیری: سەردەمی پیری. ــ جووانی: هەڕەتی جحێڵی. هێرش، پەلامار، هووروژم.

**تافاڵ** (لو.): گووێسووانە.

**تافان** (خۆ.): تووانەوە.

**تافاندن** (خۆ.): تواندنەوە.

**تافاو:** تافە ئاوی زۆر.

**تافە** (ئەردە.): دەنگی ئاو و بایە، هاشەی با و ئاو، گڤەی با. هاژە و دەنگی ئاو.

**تافەتاف:** ڕژیشتنی ئاوێکی زۆرە، کە بەخوڕ بڕژێتە خووارەوە. هەڕەت، کات.

**تافەتافیەتی:** هەڕەتیەتی.

**تافتاف:** گوڵێکی شین و بۆنخۆشی کێوییە هێندەی گوڵە مێلاقە یێکی بڵند دەبێ.

**تافتە:** جوورە چنراوێکی ئاوریشمینی جووانە. دیوا، ئاوریشم.

**تافتەخۆر:** فێڵباز، ساختەچی.

**تافتی** (باک.): کەفی کوتراوی وورد.

**تاڤ** (باد.): پەڵە هەوور. دەنگی ــ: گرمەی هەوری. (زاخ.) تاو. تاڤا بارانێ: تاوی بارانەی. هەتاو، تاو، ڕووناکی ڕۆژی، تیشک. ــ ا مریا: ڕووناکی دووای ڕۆژاوایە.

**تاڤان** (باک.): تاوی بارانەی. ئەو بارانەیە، کە لە بەهارێ یان پاییزێدا پارچەپارچە دەبارێ.

**تاڤای** (هەورا.): توانین.

**تاڤە** (باد.): تاوە.

**تاڤەهەیڤ:** مانگەشەو.

**تاڤەنگ** (باک.): پشتێند. ناوبانگ. ــ ی: ناوبانگی.

**تاڤزەرک** (باک.): زەردەی ئێوارێ.

**تاڤک:** ڕووناکی، ڕۆشنایی.

**تاڤکە:** بڕوانە: تاڤگە.

**تاڤگە** (باک.): پرژ، شیپ، شیرۆ سوولی، ڕێژاڤ، ڕێلاڤ، وەزەن، چیک. بەرکەتی. قەڵبەزە، پلووسک، ڕێژگە، قەڵپەزە. سوولاڤ، سوواڤ. (زا.) شۆش. قەڵپەز، تافە، قەڵوەزە، ئاوشار.

**تاڤگەی چکۆڵە:** فوورەهە، (باد.) فوورەک.

**تاڤل** (باک.): دەست بەجێ، دەم و دەست. ئەوەکوو، ئەبا، ئەگ.

**تاڤۆیی:** سۆز، تەزوو، گرمژە.

**تاڤهەی** (باک.): ڕووناکی مانگی، مانگەشەو.

تاڤهەی

**تاڤی** (باک.): تاوی بارانە، بارانەی بە ڕێژە و زۆر، خوڕەمە بارانە.

**تاڤێ:** ڕووناکی هەتاوێ، تیشک. تاوی بارانەیە.

**تاق:** کەس، زیندەوار، داڵەواز. تەنیا، تەنها، تەنێ، تاک، کەت، تەک. ــ ی لێ نەهێشتن: کەسی لێ نەهێشتن. چین، جار، دەستە، کەڕەت. دوو ــ: دووجار، دووچین، دوو دەستە. خەرپشتە، کەوانە، کەڤانە، گومبەز. ــ ی سەر دەرگا و پەرد و بانی ژووران، کە بەخەرپشت دروستکراوە و کەوانەییە، کە لەسەر ڕێگایان بۆ پێشوازی گەوران دروستکرابێ. (موک.) کۆشک، سەرا، سەراپەردە. تاک، بێتا، بێ هاوتا. تاقە، تاقچە، ڕێی نیوەڕۆژێک. (کە.) دان، نۆبەت، نۆرە و کاتی مالاّت دۆشین، ئێستە مەرەکەمان دوو تاقە: واتا دوودانە. (دەرک) کراوە، گوشاد. بەشێکە لە ٢٤ بەشی ئاو، هەموو ئاوێک دەکرێتە ٢٤ بەش، بە هەربەشێک لەوان دەڵێن تاق لە ٢٤ تاقەی ئەم کارێزە ٨ تاقم هەیە،

لەلای هەندێکانیش نیوە ڕۆژێکە. لێرەوە تا سابلاغ ڕۆژ و تاقێکە بە خۆشبەز. ڕۆژێکە لە نۆرە ڕۆژی ئاو.

**تاقانە:** تاکانە، یەکتا، تا، چوکڵە. منداڵێکە هیچ براو خوشکی نەبێ. نێوی نێرینانە. توند و تیژی.

**تاقاو** (ڕۆژ.): بەشاو، بەشە ئاو، بەشە ئاوی کەسێکییە.

**تاقە:** کولین. (هەورا.) خولانکە. دەلاقە، تاقچە. (خۆ.) خەلانکە. (شن.) داق. جوورە پارچەیەکی جوانی نرخدارە لە ئاوریشم و سوورمە دروستەکرێ. (باک.) چاوی گایە. تۆپ، تۆپێک پارچەی ئاوریشمی. (ئەردە.) تاک، تەنها، تاکە، بۆوێنە(تاقە گوڵێک).

**تاقەت:** تاو، تاب، تین، ووزە، هێز، توانا، پەر و پۆ، پەلوپۆ. بە ـــ: بەهێز، توانا، بەخۆوە. بێ تاقەت: بێ هێز، بێ پەلوپۆ. دابین. ـــ کردن: دابینکردن، دامەزراندن، هەڵگرتن، شاردنەوە. ـــ چوون: بێ هێزبوون.

**تاقەتکردن:** حاواندنەوەی گیاندار. میوانەکان تاقەتکە. دامەزراندنی چتومەک و وولاغ بە ڕێک و پێکی لە شوێنی خۆیدا. هەڵگرتنی کەل و پەل و شاردنەوەی.

**تاقەتگرتن:** نارامگرتن.

**تاقەجانە:** سەختترین جێگایە لە چیایاندا، نێچیر نـا توانێ خـۆی لێ دەربازکات، کە تەقەی لێ بکرێ، دەکوژرێ.

**تاقەز:** تاقیکەرەوە.

**تاقەولۆقە:** تاق و لۆق.

**تاقتاقە:** کەت کەت، تەکتەک، دانەدانە. یەکیەک.

**تاقتاقکەرە:** باڵندەیێکە بەشەو ناو نـاوە دەڵـێ (تـاق) و شـەوبێدارە، هەندێک دەڵێن وەکوو کۆتر وایە. جوورە کوندێکە.

**تاقچە:** تاقەی گچکە. تاقە.

**تاقم:** دەستەیێک لە چتێک. دەستە، تاخم، جووت.

**تاقمانە جفت:** تاقمانە جووت.

**تاقمانە جووت:** تاقمانەجفت. (ڕۆژ.) تیقمانـەجووت. یارییەکـە یەکێک چەند چتێک دەخاتە دەستیەوە و بە هاوڕێکەی دەڵێ تاقمان لە جووت ئەویش ئەگەر گوتی تاق یا جووت و بە تاق دەرچوو یا بـە جووت ئـەوی ناو دەستی دەباتەوە، دەنا کەوا دەرنەچوو دەیدۆڕێنێ. ـــ کردن.

**تاقنما:** پێشخانە، هەیوان. کۆنگرەکانی کەناری حەوشێ.

**تاق و تەنیا:** تاک و تەنها، تاک و تەراک. قەراغ.

**تاق و جووت:** یەکەیەکە، یەک و دوو. کت و جووت.

**تاق ولۆق:** یەکیەکە، تاقتاقە، کەت و پیت، تـاک و تـووک. چەند چتێکن لەپاڵ یەکتریدا بەڵام نارێک بنوێنن: مژۆڵـی تـاقولۆق وەسـتاوە، یـا ڕایەڵی کرەکە ـــ کەوتووە.

**تاقی:** (باک.) دوویێک، ئازموون. (خۆ.) زمین. بەراوەرد. ـــ کردنـەوە: دەوقاندن، بەراوردکردنی چتێک. ئەزموون، لبەر چاوێ خووە ڕاکرن. بی ئەزموو: تاقیکەوە. ئـەزمووم: تاقیمکردەوە. (ئەردە.) جوورە کڵاوێکی ژنانەیە. (باک.) کەوای بە قولاپی نەخشاو و درواو.

**تاقی پیرۆزی:** تاقێکە لە دار و ئـاڵا و تەنراوی جووان لـە نـاو شـەقاماندا دروست دەکرێ بە بۆنەی سەرکەوتنی لەشکر و جێژن و شادمانییانەوە.

**تاقیخانە:** کارخانەی تاقیکردنەوە، یانەی تاقیکردنەوە.

**تاقی زەڕ:** کڵاوی زێڕ، کڵاوێکە لیرە و پارەی زیوی پێوە دەدروون.

**تاقیک** (باک.): کەوا، کورتەک.

**تاقیکەرەوە:** تاقەز.

**تاقیکەردەی** (هەورا.): تاقیکردنەوە.

**تاقیکردنـەوە:** (خـۆ.) دوو پێـک کـردن، زمـین. ئـەزموون، لبـەرچاوێ خووەڕاکرن. دەوقاندن، (هەورا.) تاقیکەردەی. تاقیەوکردن.

**تاقیلێ** (هەورا.): تەقیلە، کڵاو.

**تاقیوەکەردەی** (هەورا.): تاقیکردنەوە.

**تـاک:** چتێکـە، کـە دووەمـی نـەبێ. تـاق، واز، کـراوەوە. تـەنها، لـنـگ، تـەنیا، تـەنێ، تاکـە، تـەک، تاکـەت، (کـف.، ڕۆژ.) تیـق. دوو تاکـە گۆرەوی: جووتە گۆرەوییەکە. (باک.) دیوار.

**تاکانە** (ئەردە.): تاکانە، تەنیاباڵ.

**تاکاندنەوە:** جیاکردنەوە، تاکەوکردن.

**تاکاننەوە:** تاکاندنەوە.

**تاکە:** تارانی. تاک، تەک، تاق، یەگانە. تا، تاکوو، هەتاکوو، تالی.

**تاکەوەخستن:** جووێ کردنەوە.

**تاکەوبوون:** جووێ بوونەوە، جیاوەبوون، تاکیانەوە.

**تاکەوتاک:** جـوورە پێـڵاو یا گۆرەوییەکـە لنگاولنگ بوون یا لنگێک لەویتر گەورەتر بێ یان ڕاست و چەپ لە پێ کرابن.

**تاکەولۆکە:** تاقەولۆقە.

**تاکەی:** تاکەنگێ، تاکەینێ. تاچەن، تاچەند.

**تاکبوونەوە:** جووێ بوونەوەی چتێک لە چەند چتان.

**تاکتاکە:** دانە دانە.

**تاکتاککەرە:** تاقتاقکەرە.

**تـاکتووک** (بـاک.): هوورومـوور، ووردەوالـە. تاکتاکە، دەنـک دەنـک، کەمکەمە.

**تاکردن:** قەدکردن، پێچانەوە.

**تاکمانەجووت:** تاقمانەجووت.

**تاکمان لە جووت:** تاقمان لە جووت.

**تاکۆ** (باک.): تاکوو، هەتاکوو، تاوەکو.

**تاکوو:** تا، هەتا، دا، داکوو، تاکی، هەتاکوو، تاوەکوو.

**تاک و تەپ:** تاک و تووک.

**تاک و تەراک:** تاک تاک، تاق و تەنیا.

**تاک و تەنها:** تاق و تەنیا.

**تاک و تەنهایی:** تاک و تەنیایی.

**تاک و تەنیا:** تاک و تەنها.

**تاک و تەنیایی:** تاک و تەنهایی.

**تـاک و تـووک:** دانەدانـە، یەکەیەکـەی پەراگـەندە لـە هـەموو چتێـک: تووتنەکەم ـــ سەوزبووە، واتە چڵ چڵە.

**تاکۆڕ:** خێڵێکی کوردە لە نزیک شاری وانییە. حسێن بـەگی تاکۆری لـە ئستراناندا ناودارە.

**تاک و لۆ:** تەکولۆ.

**تاکوولوو:** درێژ و کۆتا.

**تاکووێ:** هەتا کووێ.

**تاکێ:** تا، هەتا، دا، داکوو، تاکوو، هەتاکوو، تاوەکوو.

**تاکیانەوە:** تاک بوونەوە، تاکەوبوون.

**تال** (باک.): تاڵ، تەهل. ڕاوێژ، خەتی جوولان، تەگبیرکردەوە، پڕۆژەی کار. پشت، پەنا. وەرە خوە بدەبەر تالا من: وەرە خۆت بدە پەنای من(خۆت بشارەوە یا بپارێزە).

**تاڵ:** (باک.) تەڵخ، تال، تەهل. (فە.، دەر.) تێڵ، تیەڵ. چتێکە تامی وەک تامی تاڵیشاری وابێ یا کە کرە واژی شیرینییە وەکوو بادەمی تاڵ و نیتر. (هەو.، کە.، ڕۆژ.) داو، هەودا، لیزگ. تاڵە بەنێک: داوە بەنێک. ـــ دەزووێک: داوە دەزووێک. تیکوڵە هەنار و جەوت یا مازووی کوتراوە مەشکە و کوندەو هەمیانە و هیزەی پێ خۆش دەکرێ. شەو یا ڕۆژێکی سارد و سەرما: ئەمشەو شەوێکی تاڵە، کە لە ڕۆژی وادا جووت نەکرێ و ناژاڵیشی تێدا نەچێتە دەرەوە. پارچەیێک گۆشتی ڕەشە وا لەناوەندی سیی و جگەردا. گیانداری ڕەشکەلە (حەمەتاڵ). تووڕە، قەڵس. تاڵی شاری. ڕەش. ڕەنگی تاڵ، ڕەشتاڵە.

**تالاد** (باک.): مەتەرێز، دیواری شەڕێ.

**تالار:** هەیوانی نهۆمە بەرزەکانی خانووان. (هەورا.) تەلار، (باک.) کۆشک، باڵەخانە، بانەهڵبان، تەلار.

**تالان:** تاراج، چەپاو. (باک.) پەلیسە. یەخترمە. فەرهوود. کەل و پەل یا ئاژاڵ و وولاخێکە بەزۆر لە مرۆڤ بستێنرێ. ـــ کردن: فەرهوودکردن، بەزۆر ماڵ لە مەردوم ئەستاندن.

**تالانە** (ئەردە.): باخچە و ڕەزێکە لەبەر قەدی شاخاندا چەقێنرابێت. مێرگ.

**تالان و برۆ:** ئاخۆران و بخۆران و تالانکردنی ئەم و ئەو.

**تالانی:** تێلانی، ماڵێکە، کە بەتالان برابێ. چەپاوی.

**تالاو:** تێلاو، جەخار، خەفەت، زووخاو. (هەورا.) زەرداو. ئاوی تاڵ، ئەگەر نەخوێنی ـــ ت بە زاریدا دەکەم. مەبەس لە ئازار و ڕەنج و ئێش و ژان و زیانە. ـــ ی: تالاو.

**تالایی:** (دەر.) تاڵی، تێلایی.

**تاڵە:** (موک.) هەرزەڵە، کەردڕە. دەبیلە. جوورە دەغڵێکە وەکوو هەرزنی وایە. جوورە ڕەنگێکی گوێدرێژان و ئێسترانە، کە دێز بن. ڕەش، ڕەنگرەش. تاڵک، تاڵوو، تاڵە، کەردڕە، گیایەکە جوورە قووتێکی لێ پەیدادەبێ وەهەرزنی دەچی. (بار.) هەرزن. (هەورا.) داو، هەودا. ـــ بەنێ، ـــ دەزووێک. بەخت، شانس. زراوی نێوزگی گیان لەبەران. تەڵە، داو. (مرۆر) تاڵەکە. (هەر.) مەڕێکە چەند جەغزێکی ڕەش یا سووری لە ڕووی بێ و لەشی سپی بێ یا نا، یا لەشی سپی و دەم و چاوی بۆر بێ.

**تاڵەبانی:** خێڵێکی کوردە لە نزیک کەرکووک نیشتەجێن.

**تاڵەبۆر** (هەر.):مەڕێکە چەند جەغزێکی ڕەش یاسووری لە ڕوویبێ ولەشی بۆربێ.

**تاڵەبۆربەڵەک** (هەر.): مەڕێکە چەند جەغزێکی ڕەش یاسووری لە ڕووی دابێ ولەشی بۆربێ وپەڵەی سپی لەلەشی دابێ.

**تاڵە تاڵ** (ئەردە.): بەدبەخت، چارەڕەش.

**تاڵەڕەش** (هەر.): مەڕێکە چەند جەغزێکی ڕەش یاسووری لە ڕووی بێ وبەلان لەشی ڕەشبێ.

**تاڵەڕەشبەڵەک** (هەر.): مەڕێکە چەندجەغزێکی ڕەش یاسووری لە ڕوودابێ ولەشی ڕەشێک بێ کەپەڵەپەڵەی سپی تێدابێ.

**تاڵەسۆر** (هەر.): مەڕێکە چەند جەغزێکی ڕەش یاسووری لە ڕووی بێ بەلان لەشی سووربێ.

**تاڵەسۆربەڵەک** (هەر.): مەڕێکە چەند جەغزێکی ڕەش یاسووری لە ڕوویدا بێ ولەشی سوورێک بێ کەپەڵەی سپی تێدابێ.

**تاڵەشین سپی** (هەر.): مەڕێکە چەند جەغزێکی شین وسووری لە ڕووی بێ بەلان لەشی سپی بێ.

**تاڵەشین سۆر** (هەر.): مەڕێکە چەند جەغزێکی شین وسووری لە ڕووی بێ بەلان لەشی سووربێ.

**تاڵەشین ڕەش** (هەر.): مەڕێکە چەند جەغزێکی شین وسووری لە ڕووی بێ ولەشی ڕەشبێ.

**تاڵەشین بۆر** (هەر.): مەڕێکە چەند جەغزێکی شین و سووری لە ڕووی بێ و لەشی بۆر بێ.

**تاڵەکە** (باک.): تاڵیشک، تاڵە، تاڵک. کەردڕە (گیایەکە). مرۆر، تاڵە. چتێکە دەنکی درێژکار و بۆرەڵووک وەکوو گوومشک لە ناو گەنمدا پەیدا دەبێ نانەکەی تاڵ و ڕەش و بێ پێز دەکا لەگەڵ گەنمی سەووز دەبێ، تاڵە.

**تاڵەوەکەرەی خۆشەوەکەرە:** مەبەس لە کەسێکییە، کە دەمێکی کەیفخۆش و دەمێکیش دڵتەنگت بکات.

**تاڵبوون:** تەڵخ بوون. بریتییە لە تووڕە بوون و گرژبوون.

**تاڵخ:** سنوور، تخووب.

**تاڵداگریان:** ڕەش بوون، ڕەشەوەبوون. ڕق هەستان.

**تاڵدان:** جەوت و مازووی کوتراو بە مەشکە داکردن، خۆشکردن و دەباغکردنی پێستی خاو بە مازوو و جەوت و تێکوڵە هەنار.

**تاڵش:** شارۆچکە و هەرێمێکی کوردستانە لە ئازەربایجانی ئێرانێدا.

**تاڵشاری:** تاڵیشاری.

**تاڵشک:** تاڵک، تاڵیشک، تاڵکە، تاڵیش گیایەکی گەڵا پان وەکوو گەڵای سیس عەنبەر خۆراکی کەوانە.

**تاڵک:** جوورە هەرمێیەکە لە مانگی قەوسێدا پێدەگات، کە دوواترین مانگی پاییزێیە.

**تاڵکە:** (باک.) تەحلک. تالک، کاڵەک و گرکەی نەگەیشتوو.

**تاڵگ** (ئەردە.): تاڵیشک، تاڵشک، تاڵیش، تاڵکە.

**تاڵگە** (ئەردە.): تاڵک، تاڵشک، تاڵیشک.

**تاڵوو:** (دەر.) تاڵە، تاڵک، تێڵی. (هەو.) تاڵیشک. گیایەکە گەڵای کەمێک پان و گوڵی سوورە بەژنێک بڵند دەبێ و گەڵایەکانی زۆر زۆر تاڵ و تووکنن پنکێکی تووێ تووێی هەیە.

**تاڵووترش:** تالاو، ڕەنج، ئەرک. مەینەت.

**تاڵووتە** (ڕۆژ.): پارچە و کری سپی، کە لە لۆکە دروستکرابێ.

**تاڵ و توون:** تاڵوتوند. تووڕە، ڕق ئەستوور.

**تالووکە:** پەلە، هەشتاو، جەخت، هەڵە، گوژمە، وەتاو، هەرەمە، تاو، گوژم، تەووژم، پەلەپەل، لەز، دەست و برد. ـــ کردن: دەست و برد و پەلەپەل کردن. بەـــ : بەگوڕ، بەپەلە، لەزۆ، بەتاو، خێرا، لەزگین، پێتمار. بەـــ بوون: هنجرین.

**تالوول** (باک.): گۆچانی چکۆڵە.

**تالوولە** (باک.): کەمەیێکە بە گۆچانی چکۆڵە دەکرێ.

**تالە** (باک.): داو، تەڵە.

**تالەوریشم:** رشتە، هەرداى ئاوریشم.

**تالی:** تالاّیی، تاڵی، تەڵخی. سەختی، گێرەوکێشە.

**تالی** (باک.): گیایەکە.

**تالیتۆز:** تاری تۆسک، تاڵی تۆسک. تاڵینتۆز. گیایەکی کێوییە.

**تالیتۆسک:** تاڵیتۆز.

**تالیش** (باک.): داری قەڵەشراو بۆ ووشک بوونەوە.

**تاڵیش:** تاڵیشک.

**تاڵیشاری:** هەزوا. دەرمانێکی زەردباوی زۆر تاڵە.

**تاڵیشک:** تاڵوو، تاڵک، تاڵە، (دەر.) تێڵی، تاڵگە، تاڵشک. گیایەکی تاڵی گەڵا پانی درێژکۆڵەی بەهارییە. گوڵی زەردو دڕوواوییە بۆ دەنگ خۆشی دەدرێ بە کەوان. گیایەکی کێوییە گۆیا، کە بیدەن بە کەو گونی پێ زل دەبێ بەڵاّن، کە مرۆ بیخوات پێی دەمرێ چونکوو ژەهرە.

**تـالینتۆز:** تـاڵیتۆز، تـاری تۆسـک، تالیتۆسـک، تـانتۆز. گیایەکـە وەتاڵیشک دەچێ. گیایەکی بڵندی گوڵ گەورە و زەردە، کە ووشک بوو گوڵەکەی تۆوی وەکوو هی ڕێواسی سێ قولینچک دێنێ.

**تام:** چەژە، چێژ، چێـژە، چەشە، چەشکە، تەنگوڕ، مزە، مـەزە، میلاک. باری خۆشی یا ناخۆشییە لەکاتی خواردن یا خواردنـەوەی چتاندا پـەیدا دەبێ لە زاردا. بە ـــ : خۆش، تامدار، مەزەدار، رازراڤ، ڕانەرم. بەـــ ی: تامداری، ڕانەرمی، مەزەداری. بێ ـــ : نـاخۆش، بێ مەزە، بێ ڕانەرم. چەوری. ڕۆنی چێشتی، (ڕۆژ.) تاماش. ئەو چێشتەیە تامی تێنەکراوە. بەتام: خۆش، چەوور. بێ تام: ناخۆش، بێ چەوری.

**تامازرۆ** (ئەردە.): تامەزرۆ.

**تاماش:** ڕۆنی چێشت لێنان.

**تامان** (شا.، ئەردە.): پـەرژین، تانۆک. تـەیان، چتێکە وەکوو دیوار لـە درک یا لە قامیش یا لە چرپی دروست دەکرێ بـۆ قەدەغە کردنی خەڵکی لە چوونە ناوباغ و باغچەکەوە.

**تامەتام:** جودا، جوداجودا. جیاجیا.

**تامەتامە** (بابا.): چاویز، تۆتکان. ـــ دان: چاوبزدان. ـــ بەشت نادەم: تۆت بتکێ بەشت نادەم. (جاف.) تامێ تامێ.

**تامەتێتک** (باک.): خواردەمەنی خۆش.

**تامەزرۆ:** مگێزدار، بڕی، تامازرۆ، کەسێکە زۆر مگێزی لـە خواردنی چتێکی یا چەند چتان بێت و دەستی نەکەوێ یان لەمێژبێ نەیخواردبێ.

**تامەزرۆیی:** مگێزی. ـــ م شکا: بڕیم شکا.

**تامخۆش:** بەتام، چەلەنگ تام. ـــ ی: بە تامی.

**تـامدار:** خـۆش، بـەتام، مـەزەدار، چـەژەدار، چـەژدار. ـــ ی: خۆشـی، مەزەداری.

**تامدان:** تاڵدووزکردن بە زێڕ.

**تامزێڕ** (باک.): زێڕکێش، زەڕکەش.

**تامزیڤ** (باک.): ڕووکێشی زیوی.

**تامژاندن:** منداڵی شیرەخۆرە فێرە خواردن کردن.

**تامژین:** منداڵی شیرەخۆرە، کە دەست بە خواردنێ بکات.

**تامسار:** (بـاد.) بـە هـەوا، بـە فیز، فیزدار. (بـاک.) بێ تـام، بێ مـەزە، نـاخۆش. خواردن و خواردنـەوەی چـتی نـاخۆش. ـــ ی: بـە هـەوایی، فیزداری.

**تامۆ** (باک.): ناوی کوڕانە.

**تاموبۆ:** تام و بۆن.

**تام و بۆن:** تام و بێن، تام و بۆ. بۆن و بەرامە.

**تام و بێن:** تام و بۆن.

**تـامو خووا** (ئـەردە.): ڕۆن و خـووێ. ئـاوی زار. (ئـەردە.) نمـەک، مـەزە و تامی قسە.

**تامۆر** (ڕۆژ.): تاوێر، تامووێر. ئەو تەختە بەردە سوورانەیە، کە کانگایان هەیە. (باک.) چڵک و قرێژی قژی ئاڵۆز و نەشۆراوی گیانلەبەرانە.

**تامۆریی** (ڕۆژ.، کە.): تارمایی، تاپۆ، ڕەشانگ.

**تامووسک:** دامووسک، مووی درێژی باڵ و کلکی بارگیرانـە دەکرێـت بـە داو بۆڕاوی باڵندان.

**تامووێر:** تامۆر.

**تامێتامێ** (جا.، بابا.) تامەتامە.

**تامێتامیدان:** خواردنی چتێکی خۆش لەبەرچاوی کەسێکی بۆ ئەوەی، کـە ئـەو حـەزی لێبکـات و تـۆش بەشـی نـەدەی. تامەتامـەدان، چاوبزدان، تۆتکاندن.

**تامیزک** (ڕۆژ.): تێمیسک.

**تامیسک** (شار.): تێمیسک. زیپکەیێکە لـە دەم و لێـوی مـەردومان پەیدا دەبێ بە هۆی تا و لەرزەوە. تبخالە.

**تامێلا** (شا.) دووپاتە. ـــ کردنەوە: دووپاتە کردنەوە.

**تـان:** ڕانـاوی کەسـی دووەمـە لـە بـاری کـەلدا و بـە دووای ووشـانەوە دەنووسێ: خۆتان، بابتان، پێنووستان. (هەورا.، سۆر.، موک.) تار، تارویۆ، تان و پۆ. ڕایەڵی چتی تەنراو. بە ـــ ا چوون: بە تـان و پـۆدا چوونەخواراوەوە سا بە هەڵتان یا بە شکاندنەوەی. (زێ.، باک.) تـەیان. تانۆک، پەرژین، دیواری بە چرپی. چـەند دارێکـە وەکوو پەنجـەرە لـە نێوەڕاستی ژوورێدا دادەنرێ بۆ ئەوەی، کە بیکاتە دووبەش. ڕایەڵی چـتی تەنراوە دژی (پۆ)یە. کەمێک، نەخت، هەند.

**تانـە:** سـەرزەنش، بەسەرڕۆیشـتن. ـــ ی سـەر چاڤـە: هـەوور، هـەوری سەرچاو. پەڵەیێکی سپییە دەکەوێتە سەر بیبیلەی چاوو تاریکی دەکات. تـانۆک، چیغ. لەکە، پەڵـە. تانووت، پەلار، تـەوس، (هـەورا.) تـانێ. تەشەر. نیشانەی گەیشتنی میوەیە: بێستانەکەم کەم تانەی پێکەوتووە.

**تانتۆز** (بڵ.): تاڵینتۆز، تاڵی تۆز، تاڵی تۆسک. گیایەکە هێندەی دارە هەنارێکی بەرز دەبێ گوڵی گەورە و زەرد و سپیشی هەیە، کـە ووشک بوو تۆوەکـەی وەکـوو هـی ڕێواسـییە سـێ سـووچە و کۆلکەکەشـی کـارگی خواردنێ دێنێ.

**تانج:** تاج، زەڕگەنج.

**تانجەخەرووس:** جوورە گوڵێکە، گوڵە مەخمەری.

**تانجدار:** خاوەند تاج. ـــ ی: خاوەند تاجی.

**تانجدەروێش:** تاجی دەروێشی.

**تانج زاوا:** تاجێکی تایبەتییە لە گوڵ و رێحانە دروست دەکرێ و لەسەری زاوای دەکرێ.

**تانج کەڵەشێر:** پۆپەی کەڵەباب.

**تانجکۆڵەکە:** سەرکۆڵەکە، سەرەکۆڵەکە.

**تانجۆکە:** مووی ناوچاوانی کچی گچکەیە، کە بهۆنرێتەوە و بەسەریەوە ببەسترێتەوە تا نەچێتە نێو چاوانی.

**تانجی:** (باک.) تاجی، تاژی، بۆنجی. جوورە سەگێکی باریک و لاق درێژ و تیژڕۆیە ڕاوی پێدەکەن.

**تانجی پێغەمبەرانە:** جوورە کوللەیەکی لۆقنی بێ زیانە.

**تانجی کەیانی:** تاجی گەوهەر بەندی پادشایان لە زاراوەی گیاناسیدا. چەشنی گرد و کۆی گوڵانە بەسەر لقی دارانەوە.

**تانجییەوان:** کەسێکە، کە هەر ڕاژەی تاژیان بکات.

**تانەدرکەفتن** (ئەردە.): کۆن بوون، ڕیشاڵ. هەڵدان، کۆن و شڕبوونی جل و بەرگ.

**تانزی:** ناوی هەستیارێکی کوردە خەڵکی گوندی تانزێیە ناوی ئیبراهیمە بەزمانی عەرەبی گەلێک هەڵبەستی بەرزی داناوە.

**تانستن** (ڕۆژ.): توانین.

**تانشین:** خڵتەی بن ئاوێ و ئیتر.

**تانشین بوون:** نیشتنی خڵتە و تڵتەی ناو شلەمەنی.

**تانگ:** ڕەواندز، ڕەواندژ. قەڵاتی گەڕۆک. (باک.) تەگبیر، ڕەنێوهێنان. پێگەیشتن، خۆناسین، شەیتانی بوون. هەڕەت. د ـــ ا خووەدا: لە هەڕەتی خۆیدا. شێتی، دین، (فە.) لێوەیی.

**تان و پۆ:** تان و ڕایێخ، تاروپۆ. ڕەچەڵەک، ڕەگ و ڕیشە. ـــ یان دەناسم. ڕیشی بارامی ـــ ی تێکەوتووە: واتا داوداوی سپی بووە.

**تان و پۆی ئاوریشم:** کەسێکە، کە لەلایەن باوکیشی و دایکیشییەوە ڕەسەن و جسن بێ.

**تانووت:** تانە، تەوس، تەشەر، توانج، پلار. (هەورا.) تانووک.

**تانۆ** (باک.): ناوی نێرینانە.

**تانۆک:** بەو شووڵکە ئەستوورانە دەڵێن، کە پەرژینی پێ دەتەنرێ، شووایە. (شار.) تامان. پەرژین. (هەورا.) تەیان. (باک. ،زێ.) تان. (هەو.) ـــ ی هەوجاڕی، ـــ ی ئامووری. باسکەوجاڕ.

**تانووک** (هەورا.): تەوس، تانووت.

**تانێ:** (هەورا.) تانە، تەشەر، تانووت. هەوری سەرچاو. (ئەردە.) کەمێ، نەختێ.

**تانی:** (باک.) شووێن. (کرما.) گەردن.

**تانین:** توانین.

**تاو:** خۆر، ڕۆژ، ئافتاو، هەتاو. (باک.) تاڤ. تیشکی خۆر، تیشکی هەتاو. (هەورا.) وەر. تاب، تین، ووزە، توانایی، گوڕ. تاووشت، وورینگ. ـــ ی گەرما: تینی گەرما. خول، گێج، سوور. هەڵسووڕاندنی تاوڵەمە. کەمێک، چک، پێچ، بیست. ـــ ێکی: بیستێکی، دەمێکی. ـــ دانیشە: کەمێک دانیشە. ـــ ە بارانێک: نەختە بارانێک، ڕەهێڵە بارانێک، ڕێژنە بارانێک، کەمە بارانێک. پەلە، لەز، تاڵووکە، گورم. بە ـــ چوون: بەپەلەچوون. بە ـــ : وەتاو، بەپەلە. تەنگاو، سەخلەت. بە ـــ بوون: تەنگاو و سەخڵەت بوون. ـــ دان: تەنگاوکردن. (ڕۆژ.) فریو، تەفرە، خشتە. ـــ کردن: فریودان، تەفرەدان. گەرم، داغ، گەرمایی، گەرمی. ـــ دانی ئاسن و ئیدی: سوورکردنەوە ئاتاوی. شەوق. نەمین. ئاگری عیشقت بەتاوە مسلی شەمعی نێو فەنەر. هەژمەت. لەتاوان: لە هەژمەتان. داو، تاڵ، هەودای دەزوو و ئیتر. لنگ، غار، تەڕات. غاردانی وولاخ و خۆشڕۆیشتنی مەردوم. بە ـــ هات: بەغار هات. ترس، سام. لە ـــ ی وی نازانم بچمە کووێ. نۆبەتێ، تا، یاو. دەم، کات، گا، تاوتاو. توند، بەتاو، بەگوڕ. با ـــ دان: پێچدان، بادان.

**تاوا** (لو.): تاوە.

**تاوان:** (باک.) سووچ، گوناح، وەباڵبەرە. پیازە، سەوس، گوناه. بژارە، پاداشت، تۆڵە. هەژمەت، حەجمەت، تاوهاڕس، بەرۆست. لە ـــ : لە هەژمەتان. توانەوە. (هەورا.) پاداش.

**تاوانەوە:** توانەوە.

**تاوانبار:** تاوانکار. ـــ ی: تاوانکاری.

**تاواندار:** خوویسووچ، وەباڵکەر، بەزەکەر، فینوو، تاوانبار، سووچدار.

**تاوانداری:** سووچداری، تاوانباری.

**تاواندان** (ئەردە.): بژرادنی چتێک. پاداش دانەوە.

**تاواندانەوە:** پاداشت دانەوە.

**تاواندەر:** کەسێکە لە تۆڵەی خراپەکارێکیدا چتێکی ببژێری، ببژێر.

**تاواندن:** تواندن.

**تاواندنەوە:** تواندنەوە.

**تاوانکار:** تاوانبار. ـــ ی: تاوانباری.

**تاوانن:** تواندنەوە.

**تاوا هێلک** (بار. ، گەر.): هێلکە و ڕۆن.

**تاوای** (هەورا.): توانین.

**تاوە:** ئاخلیڤینک، ڕەمبێژ. (باک.) ڕەمپێشک، روون پێژ. (باک.) کەرسوون. ئاولنگانە، تابە. دەفرێکە لە مەنجەڵی گچکە پەلترە شفتە و هێلکە و ڕۆنی تێدا دروست دەکرێ و گۆشت و چتی تری تێدا سووردەکرێتەوە. بەردێکی پانە ئاشەوان کوللێرەی ئاشی پێ دەبرژێنێ.

**تاوەتا** (ئەردە.): تابەتا، تاخۆر. لنگاولنگ (بۆ کەوش و گۆرەوی).

تاوە

**تاوتاو:** دەمدەم.

**تاوتاوانێ** (هەو.): گەمەیێکە.

**تاوتاوە:** دەمدەمە، جارجارە، چەلچەلە.

**تاوبردن:** خۆرانگازی، خۆربردن، هەتاوبردن.

**تاوبردوو:** خۆرانگاز، هەتاوبردوو.

**تاووت** (ئەردە.): تابووت، دارتەرم، لاشکێش.

**تاوتۆ:** تاوتووی. سەرەتای نۆبەتێیە.

**تاوتوو:** تاوتۆ، تاوتووێ، تەدارەک. ـــ کردن: سەنگ و سووک کردنی دوو دەفر، کە چێتێکیان تێدابێ تا بەقەد یەکتریان لێ بێت. پێکهێنان، تەدارەک کردن، ڕێکخستن.

**تاوتووێ:** (موک.) تاوتێ، تاوتۆ. تاوتووێی برین و قوونێرە. بەرایی تاو نۆبەتییە. تاورینگ. (ڕۆژ.) گوێزتنەوە.

**تاوتێ:** تاوتۆ، تاشووب، شێوان. داگیرسانی لەشە لەبەرایی نەخۆشیاندا یا لەبەر تەزووی قوونێر و برینانە.

**تاوتی** (بار.): زەنگ، ڕژنی زەنگ.

**تاودار:** کاکۆڵی شەپۆڵدار، قژاڵ.

**تاودان:** تەنگاو و سەخلەتکردن. هاندان، فیتدان. وەپەلەپەل خستن. پۆڵا سوورکردنەوە تا هێزی نەمێنێ. گۆنگەل کرن. ـــ ی پرچ: بە گوریزەکردن، گوریزەدارکردن. وولاخ غاردان، لنگدان. پێچ دان، خولخوواردن، گەڕان، بادان.

**تاووس:** (ئاوێ.) داووس. باڵندەیێکە پەڕەکانی هەموو جوورە نەخش و ڕەنگێکی دەنووێنی بەڵان لاقی زۆر ڕەشە، نێرەکەی بە کلکی چەتری هەڵدەدا و تاجی هەیە.

**تاووسان** (فە.، ڕۆژ.، جا.): هاوین. ـــ ی: هاوینی.

**تاوستان** (دەر.): هاوین. کاتی پێگەیشتنی هەموو جوورە دەغڵ و میوەیەک. ـــ ی: هاوینی.

**تاوسەندن:** سووربوونەوەی کان لەناو ئاگریدا.

**تاووسی:** وەکوو ڕەنگی تاووسی.

**تاووش** (ئەردە.): توانایی. ووزە، تاو، وورینگ، بەرگە.

**تنۆک** (باک.): تاووک، خێوەت.

**تاووک:** چادر، خێوەت، تایلە، تنۆک. دارێکە بەقەدەر دارە توویێکی بڵند دەبێ بەرەکەی وەهی (سۆیلەتی) دەچێ، دەخورێ و شیرینە. تایلە. (باک.) تاوە، تاخلیفینگ.

**تاوکردن:** تاودان، هاندان.

**تاوکێش:** تەنراوێکە، کەناوبەناو تاوی لێ دەرهاتبێ (تاوکێش بوون). دەرهاتنی تاوی چتی تەنراو ناوبەناو. ـــ کردن: دەرهێنانی تاوی چتی تەنراو ناوبەناو.

**تاوگاز:** هەتاوبردوو. ـــ بوون: هەتاوبردن. بۆ ـــ ی گیای پرپرە بخورێ و خۆی پێ بشۆری زۆر باشە. دژی داندژکێش لە لەشی بدرێ زۆر باشە.

**تاوگرتن:** داگیرسان، سووربوونەوە، تاوسەندن.

**تاووگ:** تایلە. دارێکی کەژییە بەرێکی زەردی شیرین دەگرێت وەکوو قەزوان دەخورێت لەگەڵ توو و گوێز دەکرێت بە کوتە بۆ خواردن زۆر خۆشە.

**تاووڵ** (ئەردە.، پژ.): دەوار، ڕەشماڵ. خێوەتی ڕەش، کوویَن.

**تاووڵە:** تەختە نەرد. ـــ ی قوماریَ. ـــ کردن: یاری نەرد کردن. مێز.

**تاوڵە** (ڕۆژ.): تەویلەی وولاخی بەرزەیە. نەرد، نەردێن. گیای گژنیژ.

**تاولەرز:** (هەورا.) یاولەرز.

**تاوڵەکێفیلە:** گژنیژە کێویلە.

**تاوڵەمە:** ئاگر گەشکەرەوە، ئاگر گەشوکەر. ئاگریادەر.

**تاولێهاتن:** بێ تاقەت بوون، تالێ هاتن. بێ ئارام بوون، سەخڵەتی.

**تاونان** (کە.): ڕاونان، ڕەپێ نان.

**تاونیان** (ئەردە.): ڕاونان، تارینان، تەرەدوانیان. لنگدان.

**تاوی** (باک.، بار.): تادار، نۆبەتێ دار. گیایەکە. جوورە دارێکە، تاووک.

**تاویار:** تاوێر لە برێشکە و چتی تر، ئەوەندە، کە بە جارێکی لەناو تاوەیەکیدا ببرژێ یا سوورکرێتەوە.

**تاویان:** توانەوە، ئاوبوون، بوونە ئاو.

**تاویانەوە** (زەن.): توانەوە.

**تاویاندنەوە** (زەن.): تواندنەوە.

**تاویەتی:** تایبەتی، تابیەتی.

**تاویدە:** خەیاتە، دەزوو، پڵیتە.

**تاوێر:** (موک.) ـــ برێشکە: ئەوەندەیە، کە بەجارێکی لەسەر ساجی ببرژێ یا سووربکرێتەوە لە دەغڵ و قاوە و ئیتر یا بەشە کەشکێک، کە لە سوورێندا بسووڕێتەوە. پرووشە، کارەسات، هەنگامە. تەلەبەرد. گاشە بەرد، تامۆر. (ڕۆژ.) تاموێر. گاشە بەردێکە بەزەویدا پان بوویێتەوە. ـــ کردنەوە: خلۆرکردنەوە. بەردی تیشانە، کە تەلاش تەلاش لێک جووێ دەکرێتەوە، شینکارە. ئەو تەختە بەردە سوورانەیە، کە کانگای هەیە. تاتە ـــ: زنجیرە تاوێر. (کە.) ـــ ی گۆڕان: کێل. (ئەردە.) هەتار، هەتاری گەورە. گاشە بەردێکە، کە لە چیایان خلۆردەبێتەوە.

**تاوێکی:** دەمێکی، بیستەکی.

**تاویلکە:** تاوەی گچکە.

**تاوین:** توانەوە.

**تاوینە:** توانەوە.

**تاوێوە** (هەورا.): تاوێکی.

**تاهۆڕ:** جەوالی زۆر گەورە.

**تاهوو** (باک.): ئامرازێکی گەپ پێدان و قەشمەری پێکردنێیە.

**تاهیر:** بابا تاهیری هەمەدانی، هەستیارێکی کوردی ناوداره یەکەمین کەسێکە، کە لە دووای پەیدابوونی ئایینی ئیسلام هەڵبەستی بە کوردی دانابێ یا دەسکەوتبێ و مابێتەوە.

**تایاخ** (ڕۆژ.): قۆندرە، کەووش.

**تایە:** شاراو، گیشە. تا، چەند مەلۆیەکی لەسەریەک دانرابن بۆ ئەوەی بکرێن بە خەرمان. بەو باوەشە دەغڵانەش دەڵێن، کە دووایە خردەکرێنەوە بۆ سەر خەرمان. گزرە گیایەکە کەڵەکە کرابێ بۆ زستانی ئاژاڵان. ـــ ی ئۆتومبێل و عەرەبانە و ئیتر. (موک.) تەگەرە. چەرخ، لاستیکی پێچکی ئۆتۆمبێلان و هەندێ چتی ترە.

**تایەبەتی:** تایبەتی.

**تایەفی:** ترێی تاییفی، جوورە ترێیەکی سووری درێژکۆلەیە.

**تایەکاری** (ڕۆژ.): تایبەتی، تەنانەت.

**تایەن:** (هەورا.، دەر.) دایەن، دایە، تەیان، دایان. ئافرەتێکە بەکرێ شیر بە منداڵی یەکێکی تر بدات و بەخێوی بکات. بۆ کەسێک بەکاردێنرێ، کە لەسەر کارێک سەرزەنش و سەرکۆنە بکرێت و ئەویش بەرهەڵستی

بکات؛ ئەمن دەڵێم بخوێنە کەچی کابرای تایەن ئێخەم دەگرێت. ناوبراو، باسکراو، ناسراو. هەرامە، ڕانێک، هێن.

**تایەنی:** بەخێوکردنی منداڵێکی شیرەخۆرەی کەسێکی لەلایەن ئافرەتێکی مەمکداردا بەکرێ.

**تایەنێر** (ڕۆژ.): گیشەکەر، تایەدانەر.

**تایبەتی:** دانستە، بژاردە، دەستبژێر، خۆماڵی، خۆکرد، تابێتی، خۆسەر، تایبەتی، تایەکاری، (هەو.) ڕادایی، دەستندە، خاسما، نەخازەلا. بە ــــ : خووسەر، نەخازم، نەمازە.

**تایلە:** دارێکی دێمییە گەڵای وەک هەڵووژە وایە بەرێکی شیرینی پایزەی زەردی خڕی هەیە وەک نۆک دەخورێ، تاووک لەسەر گۆڕستانی دەچەقێنن.

**تاییژ** (باد.): تەشکەبەڕە، پارچە بەڕەیێکی تەسکە.

**تاییفی:** جوورە ترێیەکی سپییە گلووی زۆر درێژە، دەنکی هەیە.

**تایین:** گۆڕین، باسکراو، ناوبراو. (باک.) پێژنا.

**تایینچە** (شا.): ڕەشکەی کایەکی دووتایە جووایەز جووایەزن بەیەکەوە درووراوون. تایەکی گچکە، کە بەدووان دەبێتە بارێک.

**تاییە** (باک.): دڵەردوو، خۆپارێز.

**تە:** (باک.، هەورا.ـ کۆن) تۆ، ئەتۆ، توو. (زەن.، دا.، ڕۆژ.) کچ، کیژ، دۆت. (ڕەوا.، زرا.) لە، دە. تەکەوری کەت، تە خەرەندی کەت، تە بانی کەوت: لە بانی کەوت. تە دەستی دایە: لە دەستی دایە.

**تەب** (باک.): ڕەشەبا.

**تەبا:** ئاشت، ئارام، بێ دەنگ، جووت، ڕێک، کۆک. پێکەوە، دەگەڵ، لەگەڵ، ڕە، بە ــــ وە، بەهەڤڕە. بسکان بزلفانرا: بسک بە زولفانەوە. (باک.) دڕندەی گچکەو کێوی. چت، چتمەک. واق ووڕماو، سەرگەردان. (هەورا.) دەوڵەمەندی ئازا، بەجەرگ، دلێر.

**تەباتۆر** (باک.): تونی جاڵجاڵووکە.

**تەباخ** (باک.): مانگی خەرمانانە، ئاب.

**تەباخچە** (باد.): سینی فنجانی قاوەیە.

**تەبارە:** (هەو.) بەر، بەش. دەغڵێکی بە پێوەیە و گوڵەکانی پێگەیشتبن و ئامادەی درووێنەی بن. (دزە.) تەوارە. (بابا.) گیشە، گەلاوێژ، شارا، گەنم و جۆی درواوە. کەڵەکێک یا نیشانەیەکە لە ناوەندی دوو شوێناندا بکرێ بۆ جوداکردنەوەیان لە یەکتری. (بابا.) زەوییێکە بە پاڵ کەژ و کێواندا لە چەشنی پلیکان دروستکرابێ تا زەوییەکە ڕاست بکرێتەوە بۆ چەقاندنی دار و درەخت و چاندنی کشتوکاڵ لێژی نەمێنێ.

**تەباغ:** بڕوانە: تەباخ.

**تەبانە** (باک.): بانگردێن.

**تەبانچە** (باک.): ئامرازێکی مۆزیقەیە.

**تەبایی:** کۆکی، ئاشتی، ڕێکی، ڕێکێتی، ئارامی، بێدەنگی، یەکێتی، جووتی، پێکەوە. بە ــــ : بە جووتی و هاوالایەتی پێکەوە.

**تەبەتۆر** (زا.): خانوو و تەونی جاڵجاڵووکە.

**تەبەر:** تەوەرزینی دەروێشان.

**تەبەرزە** (موک.): ترێیەکی سپییە گلووی وەکوو کشمیشی وایە و دەنکی ووردە.

**تەبەرزین:** تەوەرزین.

**تەبەش:** مەڕێکە سەر و ملی نوختە نوختەی ڕەش یا سووری پێوەبێ و لەشیشی سپی بێ.

**تەبەش بەڵەک:** مەڕێکە گەردنی نوختەی سوور یا ڕەشی تێدابێ بەڵان پەڵەی ڕەش یا سووری لە لەشدابێ.

**تەبەق** (موک): دەردێکە وەکوو شلکە تووشی سم و ناو سمی ڕەشەووڵاغان دەبێ، ژێر سمی بریندار دەکات و ناتووانێت بڕوات. لە بیرمە کە چەند جارێکی ڕەشەووڵاغی وایان لەنێو قوڕە ڕەش یا قوڕێکی پیس و بۆگەندا ڕادەگرت چاک دەبوونەوە. هەر منداڵێکی شیری وی بخووا بلۆق لە زمان و ژێر لێوی دێ. (دەر.، هەورا.) تەبەقە. (هەورا.، موک.) سینی دارینە. خارووفک، لەنگەری، تەبەک. تەبەقەی قاقەزی و ئیتر. (باک.) دەوری. (بابا.، دەر.) تەبەک. دەفرێکی دارینە بە خەرت دروستدەکرێ هی گەورە بۆ هەویر تێدا شێلانییە هی گچکەتر بەقەد دەستە سینییەکی بۆ تێدا هەڵتەکاندنی دانەوێڵەو تەتەڵەکردنی بەکاردەبرێت.

**تەبەقە:** (دەر.، هەورا.، ڕەوا.) تەبەق، دەردێکە تووشی سم و ناو سمی ڕەشەووڵاخان دێت. لەنگەر. (موک.): تەبەقەی قاقەز و ئیتر.

**تەبەقەترانە:** چتێکە لە کەسێک دەستێنرێ، کە لەناو مەردوماندا تڕی لێ بەربووبێ.

**تەبەک:** تەشتێکی دارینە هەویری تێدا دەشێلن. (باک.) خارووفک، مزاخە. ترار، شکەویک، شکۆک. (هەو.) ئینجانە. (خۆ.، شنۆ، بار.، دزە.) ئەشکەو. (زرا.) پشخووان. ئەشکەفک، شکەفک. (هەورا.) دۆڵە، لەنگەری. (بابا.، دەر.) تەبەق. (خۆ.) کاسە. (باک.) ترار. (باک.) ژووری دانەوێڵەیە. سینی دارین.

**تەبەل** (زاخ.): مەڕمەڕ، کەللا.

**تەبەلیە:** قەڵماسک ئاسایەکی گەورەیە، کە بۆ چوونە سەر داری خورما بەکاردێت.

**تەبەنە:** (فە.) دلیوان. (کە.، دەر.) دیلوان. تەبەنی، دەرزی گەورەی کەلاش چنینی.

**تەبەنی:** تەبەنە.

**تەبتاندن:** دڵخۆشی دانەوە، حەجماندن، دڵدانەوە، ئارامیدان.

**تەبتین:** حەجمین، ئارامگرتن.

**تەبخاڵە** (زەن.): پەڵەیێکی نەنگدارە بەسەر ڕوخسارەوە. تێمیسک، زیپکەیێکە دووای تاولەرز بەسەر لێوانەوە پەیدا دەبێ.

**تەبر** (لو.): تەوور.

**تەبسی:** سینی چا و قاوە و شیر و چتی تری لەسەر دادەنێن دەیبەنە پێش میوانان.

**تەبع** (موک.): کەسێکە لەبەر نەخۆشی یا خواردنێکی زۆر چەور یا زۆر خواردن چیکڵدانەی شێوابێ. ــــ ی: دەوا. تێکچوون و شێوانی چیکڵچدانە لەبەر نەخۆشی یا چێشتێکی زۆر چەور یان زۆر خواردنێ.

**تەبکاندن** (باک.): ڕۆچوواندن. بتەبکینە: ڕۆی چووێنە.

**تەبکین** (باک.): ڕۆچوون. بتەبکە: ڕۆچۆ، ڕۆبچۆ.

**تەبڵە** (هەو.): ناڵبەکی، ژێرپیاڵە.

**تەبلی** (باک.): خووەلی دانک، ژێر جغارە.

**تەبوور** (زا.): شەن.

**تەپ:** تەمبەڵ، سست، خاوخلیچک، خاولیچ، تەپان، بڵح، تەپاوتەپ. دەنگی کەوتن و لێدانیییە. (باک.) تەرپ. گران، کپ، کیپ. گوێ ــ: گوێ گران، گوێ کپ. (باد.) خوو، فێ، پەرکەم. (بابا.، سۆ.، باد.) بێ هۆش، کاس. بە ــ ا کەوتن: بێ هۆش بوون. (باک.) فێڵ، تەفرە، فریو، فڕوفێڵ. ــ لێ کرن: تەپ لێدان: فریودان. دەستاڕ. (باد.) شەپەلاخە،چەپۆکە، زللە. ــ و مست: بە شەپەلاخە و مست، بە چەپۆکە و مست. (زا.) فێ. (باد.، ئەردە.) تەپۆڵکە، گرد. کۆمەڵێک لە چت. کۆما، پاخوا، کۆمەڵە، خەرمان. سل، ساق. ــ یک گوو: سلێک یا ساقێک گوو، ــ یک تەپاڵەی ڕەشەوولاغ، کە پان بووبێتەوە. پیسایی ڕەشەوولاخان.

**تەپارک** (زا.): قوڕڕشیاکەیەکە تێکەڵ کرابێ و دەمی کوورەی هەنگی پێ سوواخ درابێ.

**تەپاڵە:** دەوەدەشتی، دەوەکێویلە، شیاکەی ووشکی ڕەشەوولاخانە، تەپڵە،ساهەک. (دەر.، هەر.، کۆ.) سەرگین. سەنێر. (باک.) کۆخە، تەپەرژشک. (هەورا) سەورۆ. (دەر.، باد.) لاس، سەرگین. (زەن.) سەهەن. (باد.، کە.) تەپک. تەپۆڵکەی گچکە.

**تەپاڵدان** (ئەردە.): تەپاڵەدان.

**تەپان:** تەپین، نزم بوون، ڕۆچوون، داهاتن، ڕووخان، داتەپین. تەپین. تەختەیەکی ئەستوورە لە دارە بی یا گوێز دەخرێتە ژێر بەرداشەکەی بنەوە ، نێوەڕاستەکەی نەختێک قووڵە ئاسنێکی خڕی وەکوو گوللە تۆپی لەسەر دادەنرێت گوللەکەش قووڵبستەکەی لەسەر دادەنرێت، خوانکەی ئاش، ئەو شوێنەیە (مۆرە سەنگی) لەسەر دادەنرێت و لووتی بۆسکیشی دەخرێتە سەری. (ڕۆژ.) تەختەیەکیشە، کە وەژێر ڕێسمەی دەرگا دەدرێت لە ژێرەوە و سەرەوە، گرێژەنەی دەرگا. (مەک.) زل، قورس، سست. تەنبەڵ. (ڕۆژ.) تەپاوتەپ، تەپ. (زا.) گەلاڵوتک.

**تەپانج** (ئەردە.): تەپاندن، تێ ئاخنین، تێ پەستاوتن.

**تەپانچ** (ئەردە.): تەپانج.

**تەپاندن:** قوپاندنی بان و هەمموو چتێکی، کە ژێری بۆشبێ. تەپەلێهێنان، لێدان. ئاخنینەوە و پڕکردنەوەی چت. لە کاتی خواردنێدا زۆری تێ مەتەپێنە.

**تەپانن:** تەپاندن. (ئەردە.) تەپاندن.

**تەپاوتەپ** (ڕۆژ.): تەپ، تەپان. کەسێکە زگی باوسێ و بیەفێ یا با بکات بەهۆی خواردن و ئیترەوە.

**تەپاوتل:** تل دان بە پاڵ کەوتنەوە.

**تەپە:** دارێکی گردی لووسە بە بن میچەوە ڕایەڵی تەونی دەخرێتە سەر. تەپەی ئارەقچن، تەپلاک. پارچەییکی خڕی نێو کەللەی ئارەقچنییە، دەنگی چتێکی نەرمە لە کەوتندا. (جا.، هەورا.) گرد، تەپۆڵکە. قەلات.

**تەپپە:** دەنگی کەوتنی چتێک و دەنگی پێی وولاغ و زەلام، ترپە.

**تەپەتەپ:** ڕمبەرمب، ڕپەرپ، ڕەپەرپ، تلپەتلپ، ڕەپەڕەپ، (ڕۆژ.) تەپەتپ، تەپەی یەک لە دووای یەکتری. (باک.) تەدارەکات. ترپەترپ.

**تەپەتەپان** (ئەردە.): تەپەتەپکردن.

**تەپەترە:** منداڵێکی تازە پێیهەڵگرتووە کە زوو زوو بکەوێ.

**تەپەدان:** تەپدان، کۆکردنەوە، خەرمان کردن.

**تەپەدۆر:** جوورە دارێکی نەرمە سەری شووشەی لێ دروستدەکرێ.

**تەپەدووکەڵ:** چەرەدووکەڵ.

**تەپەرۆشک** (باک): تەپاڵە.

**تەپەسەرا** (شێخان): بێچارە، پەپووک.

**تەپەکلاو** (ئەردە.): تەپڵەکی سەر کۆڵەکە و هەستوونی دەوارە. تەپەی ئارەقچن و کلاو.

**تەپەگوو:** (ئەردە.) تەپک.

**تەپۆڵۆک:** تەپۆڵۆکەی کێوان، سەرسەرەوەی کێوان. تەپاڵەیەکە، کە بۆ سووتاندنی پانکرابێتەوە. تەپاڵەی ناو زەوی.

**تەپۆڵووک** (دەر.): تەپۆلکە.

**تەپەوتەلان:** زەوی و هەردی پڕشەپۆل. زەوی پڕ کەند و کۆسپە و هەوراز و نشێو.

**تەپتەپ** (باک.): لێدان. ــ ا دل: لێدانی دڵ، دڵ لێدان.

**تەپتەپە** (دزە.): ئەستوورکی ساجی. (هەورا.) نانی دەستی.

**تەپج:** شوێنێکە ڕووخابێ و تەخت بووبێ. ــ بوون: ڕووخان، تەخت بوون. ــ کردن: ڕووخاندن.

**تەپدان** (ئەردە.): خڕکردنەوە و کۆمەڵکردنی چت. تەپدانەسەر. خڕبوونەوە و کۆمەڵبوون: ڕانەکە گورگیان بەدی کرد تەپییاندایە سەریەک. گەیین، بەسەردا زاڵ بوون.

**تەپدانەسەر:** هەڵمەت بردنەسەر چتێک و داگیرکردنی.

**تەپرەش** (باک.): ئاوان، ناپاک، نهێنبر، بەدفەک، دڵڕەش. فێڵباز. (باک.) ــ ی: ناپاکی، ئاوانی، بەدفەکی، نهێنبری، دڵڕەشی.

**تەپس:** بێ دەنگ، پۆشراو، ئارام. لێدان. ــ بوون: بێ دەنگ و ئارام بوون. ــ کردن: بێ دەنگ و ئارام کردن. لێدان.

**تەپساندن** (باک.): پانکردنەوە، ڕاخستن، تەنککردن. لێدان، کوتان. بتەپسینە.

**تەپسی:** ژێر جغارە. تەشپی، دەفرێکە وەکوو دەوری پان و گچکەیە و وەکوو لەنگەری لە دار دروستدەکرێت.

**تەپسیلە** (خۆ.): جوورە چێشتێکە.

**تەپسین** (باک.): پانکرانەوە، ڕاخران، تەنککران. لێدران.

**تەپشوو** (هەر.): تەوشوو، تەوشی، تەشووێ. (ڕەوا.) تەمشوو. (دەر.) تیشی.

**تەپشی** (ڕۆژ.): کۆچیلەی دارە بۆ چێشت تێدا خواردن.

**تەپق:** داکەوتن، قوپان، تەپک. ــ بوون: داکەوتن، ڕۆچوون، قوپان. ــ کردن: ڕۆچوواندن، قوپاندن، بۆ قاپ و مەنجەڵ و سەربان و ئیتر.

**تەپقین:** قوپان، ڕۆچوون (بۆ قاپ و مەنجەڵ و سەربان و ئیتر).

**تەپک** (کە.، باد.): تەپاڵە، سەرگین. تەپۆڵکە، گرد. (باک.) تەپکە. لەرزان، بەلەرزەوە. چتێکە لە خوری و تووکی ووشتری دروست دەکەن و گەمەی پێدەکەن.

**تەپکە:** ڕەت. (کە.، باد.) تەپک، سووت، سووتە. تەپکەی ڕاوی باڵندان. گەمرە یا بەردێکە لەسەر چاڵێک بە چیلکەیەک بە ئاستەم

ڕادەگیرێ بۆ ئەوەی ئەگەر باڵندەیێک بچێتە ناویەوە تەپکەکە بەسەریدا بکەوێ. سل، ساق، تەپە پیسایی مرۆڤان چاڵێک پارچە بەردێکی دەخرێتە سەر چیلکەیەکی دەدەنە بەر بەردەکە، کەمێ گەنمیش بە چاڵەکە دادەکەن، کە باڵندە بچێتە ناوییەوە و خۆی لە چیلکەکەی بدات دەترازێ بەردەکە بەسەر زاری چاڵەکەدا دەکەوێ ئەوسا ڕاوچی بە هێمنی باڵندەکەی بە زیندوویی دەگرێ. گەمرە، کەمرە، شیاکەو پیسایی ئاژاڵ و وولاخانە کە لە تەویلە (گەوور)دا بەسەر یەکتریدا سەپابێ و بە پارچەی زل و پان هەڵدەکەنرێ وەکوو تەلەبەرد. (ئەردە.) تەپڵە گەوون، تەپڵەگوێنی.

**تەپکەر** (باک.): فێڵباز، (باک.) تەپۆ.

**تەپکەکۆخ**: میچ و سەربانی کۆخانە، میچ و سەربانی زنجانە.

**تەپکردن** (زا.): خۆمت کردن لەترسی چتێک.

**تەپل**: نەخشی سەر پەنجەی دەست کە لەسەر کاغەز دەگیرێ.

**تەپڵ**: دەهۆڵێکی گچکەیە جاران سوواران جووتە تەپڵێکیان لەو بەرەوبەری قەڵپووزی زینی قایم دەکرد و لێیاندەدا، دابریم. تەپڵی سازو ئاواز. تەپڵسەر، تۆقەسەری مرۆڤ و چیایانە. (شن.) ئەوەندە گیا یا دەخڵەیە کە بە شەنە هەڵگیرێ.

تەپل

**تەپڵزەن**: تەپڵ لێدەر، کەسێکە تەپڵی باش لێبدا.

**تەپڵاک** (ڕۆژ.): تەپۆڵکە، گرد. تەبەی ئارەقچنان.

**تەپڵە**: کەلارە، دەفرێکی گەورەو قووڵە لە شیاکە دروست دەکرێ بۆ شیاکە خڕکردنەوە.

**تەپلە**: جوورە کڵاوێکە وەکوو فێسی وایە و هەیە زۆر درێژتریشە لە خوری دروستدەکرێ (هەورا.) کۆلوس، کووم، تەپلی، تەپکە، هەورامی و جووانرۆیی و لوڕوکەڵهوڕ و ئیتر لەسەری دەکەن. تەپڵەکی جگەرە. کەلارە. (ئەردە.) تەپەی کڵاو.

**تەپلە ئاڵتوون** (هەورا.): کڵاوزێڕین.

**تەپڵەتر** (ڕۆژ.): منداڵی خاووسست و بێکارە. تەمبەڵ، دەستەوەستان.

**تەپڵسەر**: تۆقی سەر، تۆقە سەر، (جا.) تەوقەسەر. بۆلک، تۆقەسەری هەموو چتێک.

**تەپڵەقوو**: دارێکی کێوییە لە بەلاڵووک دەچێ، تیری لێ دروستدەکرێ. تەپلەقوو.

**تەپڵەک**: (ئەردە.) قونە، گونیە، (ئەردە.) بەس. پارچە ئاسنێکی باریک و تریک و درێژووکە یا سێ سووچە لە شووێنی شکاوی کورسی ومێزی دەدەن تا قایم بێ. قەرتاڵەی پێست بە ڕوو داگیراوە. (هەورا.) قیرتەبەق. سەرەدارێکی درێژکۆڵەیە دەخرێتە سەر کۆڵەکە و نێرگەی لەسەر دادەنرێ، (ئەردە.) کۆماجە. (ڕۆژ.) چەرمێکی خڕە کونەدە و مەشکەی پێ پینە دەکرێ. تەپەی ئارەقچنی. (کە.، جبا.، ڕۆژ.) زنج، کوخێکە دیوارەکانی لە خشت و قوڕیان لە بەرد و قوڕبێ بەلان سەربانەکەی بە پووش و قامیش و هەلاش گیرابێ. ژێرجگەرە، ژێرجغارەگچکە.

**تەپڵەکی ڕۆژ**: گۆی ڕۆژێ، گۆی خۆر.

**تەپڵەگوێنی**: جوورە بنەگوێنییەکە بە حەردیدا پان دەبێتەوە و کەتیرەی جەباری لێ پەیدا دەبێ.

**تەپڵسوواری**: تەپڵی سوواری.

**تەپڵک** (باک.): ئالبەکی. (زا.) تەپڵ.

**تەپڵک** (ئەردە.): دیوارێکە خەریکی ڕمانێ بێ یان کەناری چۆمان، کە ئاو بنەکەی دڕی بێ و لە ڕووخانبێ.

**تەپلۆس**: تەمبەڵ، تەوەزەل، کارلێ نەهاتوو.

**تەپلۆسی**: تەنبەڵی، تەوەزەلی.

**تەپلی** (هەورا.): تەپلی لباد.

**تەپلی تۆپێن** (بابا.): جوورە گەمەیەکە، تۆپی دادەکوتن لە بەرزبوونەوەیدا بە دەستی لێیدەدەن و دەیسووڕێنن و چەند جارێکیش هەربەوجوورە دووپاتەی دەکەنەوە. بۆ لێدانی کەسێکیش بەکاردەبرێ.

**تەپ نەکوتان**: نەدیتن، پەی پێ نەبردن.

**تەپۆ**: (باک.) فێڵزان، فێڵباز. (خۆ.) جوورە مێشوولەیێکی باڵدرێژە و پیس پێوەدەدا. پۆرگ.

**تەپوو** (بابا.): هورە. جوورە مێشوولەیەکی گەورەیە.

**تەپووتل**: تەپاوتل.

**تەپووتۆز**: با و تۆز و خۆڵ، تۆز و گەردی زۆر. گەردولوول.

**تەپووخ** (ئەردە.): مەردومی سەرەنگرێ.

**تەپوودوکەڵ**: تەم و دوو، تەم و دووکەڵ.

**تەپوودۆڵ**: هەوراز و نشێو، تەپۆڵکە، زوورگ. هەردێکە کەند و کۆسپەی زۆربێ.

**تەپۆکە**: تەپۆڵکە.

**تەپووکۆ**: کەوتن و هەستانەوە. فیسارەکەس بەشەو هەر ــ یەتی واتە لەبەر کزی چاوی هەردەکەوێ و هەڵدەستێتەوە.

**تەپووکوت**: لێدان، کوتان.

**تەپۆڵە**: تەپۆڵکە، گرد.

**تەپوولە** (ئەردە.): تەپۆڵکە، گرد.

**تەپۆڵکە**: گردی چکۆڵە، تەپە، کۆسپایی ناو زەوی، تەپ. (باک.) گردۆڵک، گوویک. (ناو.) خرابە. (ڕۆژ.) تەپلاک. گرا، تەپەلووک، هەردەم، هەرەم، گردەلووک، کۆسپایی زەوی. ــ ی سەرچیایان: بەراز، بازگە، ترۆپکە.

**تەپۆڵکەتەپۆڵکە**: تەپودۆڵ، هەوراز و نشێو، زوورگ.

**تەپوولوول** (هەورا.): تەپ و مژێکە لەکاتی بەفر و باراندا پەیدا دەبێ.

**تەپ ومژ**: (زەن.، مز.) تەم. تەم و مژ، مژ، مۆران، مژەکۆر. چتێکە وەکوو دووکەڵ ڕووی زەوی دەگرێ چاو باش نابینێ.

**تەپۆنکە**: تەپۆڵکە.

**تەپونم**: تەپ و نیم، بارانەی هێواشی لە سەرەخۆ لە کاتێکا، کە تەم و مژ دایدابێتە سەر زەوی.

**تەپونیم** (باد.): هەور و بارانەیە پێکەوە.

**تەپ و هۆڕ**: تەپەتەپ و هەراوهۆریا.

**تەپی**: سستی، تەنبەڵی.

**تەپیان** (ئەردە.): تەپین، قۆپان. ئاخزان، تێ پەستاوتران. پڕکردن.

**تەپیک**: قابێکی ئاوونجییە.

**تەپی لێ ناکوتێ** (ئەردە.): نایزانی، سەری لێدەرناکا.

**تەپین:** ڕۆچوونی بان و هەموو شوێنێک، کە ژێری هوڵۆڵ بێ لەبەر قورسی. قۆپان، قۆپیان. نزم بوون، ڕۆچوون، داهاتن. داتەپین، ڕووخان، تەپان، هەرافتن. ـــ ی کاڵەک و شووتی لەبەر کۆنی. ـــ ی مەردوم لەبەر پیری. لێدانی دەمار. (باک.) دەنگی لێدانی دەستە، تەرپین. دڵە تەپێ، دڵە لەرزێ.

**تەپیو:** داتەپیو، ڕۆچوو.

**تەت** (باک.): چەچە، دەستی چکۆڵەیە، چەچ لە زاراوەی منداڵاندا.

**تەتاڵە** (کە.، ڕۆژ.): کۆتەرەی سەری کۆڵەکانە.

**تەتە:** (ئەردە.) تەختەیێکی ناسکە. (موک.) منە. مت و مووروو، چتی جوان و قشتیلە، زاراوەی منداڵانە. بووکڵەیەکە لە هەویر یا لە قوڕ دروستەکرێ منداڵان یاری پێدەکەن. (ئەردە.) ماڵنج، ماڵە، لیسە. تەختەیەکی تەنکە گۆزە و دیزەی پێ لووسەدەکرێ لەکاتی دروستکردنیدا. کەسێکە بەدەست و برد نامەی مەردم بیات بۆ خاوەنی.

**تەتەبەخۆ** (ئەردە.): تەتە، وێنەی جانەوەرێکییە منداڵان لە هەویری دروست دەکەن.

**تەتەر** (هەورا.، ژا.، ڕۆژ.، جا.): توند و تۆڵ، چوست و چالاک. شاتر، نەوەن، پەیک. ڕێگر، جەردە، پیاوخراو، نامەرد.

**تەتەپێچ:** پێچانی دەستی شکاوە بە قامیش و مشەما.

**تەتەری:** توند و تۆڵی، چوست و چالاکی. شاتری، نەوەیی. جەردەیی.

**تەتەشۆر** (ئەردە.): تاتەشۆر، مردەشۆر.

**تەتەک** (ڕۆژ.): ڕەگی سەوزاییانە.

**تەتەڵە:** (هەورا.) سێبەندە. (ئەردە.) ڕوومەت. ـــ کردنی دەغڵ و توورتن. (هەورا.) تەترە، تەتڵە. پاکردنەوەی دانەوێڵەیە بە هەڵتەکاندنی لە دەفر و لەنگەری و بێژنگ و چتی تردا بۆ جووێ کردنەوەی خۆڵ و بەرد. سمت کلۆڵ. ـــ کردنی مێشک: زاخاوردان و لێکدانەوە. پارچە تەختەیێکی لووسە ئەلف و بێی تێدا نووسرابێتەوە بۆ منداڵان.

**تەتەڵەکردن:** پاک کردنەوەی دانەوێڵە و خۆڵ و وورده بەرده بە هەڵتەکانی لەناو لەنگەری و هەرجۆرە دەفرێکی تردا. بۆ جووێ کردنەوەی خۆڵ و وورده بەرد. هەڵەکردن لە گوفتوگۆدا. سەرکردنی گوللە و پەلار لە نیشانە شکاندنێدا.

**تەتەڵەمیران** (موک.): زیکریلە. (ڕەوا.) مەڵکەسمن. (زەن.) توتکەشوانە. تەتڵەمیران. کرمێکی ڕەش و تووکنە لەسەر گیایان تەونی دەکات، دوو ڕێز قاچی هەیە ڕەنگی بە زەڵەیە بە کۆمەڵ لە بن گیایاندا جم و جووڵیانە.

**تەترە:** تەتەڵە. ـــ کردن: تەتەڵەکردن.

**تەترەخان** (باک.): نەخۆشییەکە.

**تەتک** (زا.): دەستەوانە، دەستکێش.

**تەتکەبزانە** (دەر.): دەنکی بەری داری کراتییە، دەنکی بەری داری کەزۆکییە.

**تەتڵە** (هەو.): تەتەڵەی دەغڵ و توورتنییە، (ئەردە.) گووپ، ڕوومەت، کولمە.

**تەتڵەمیران:** تەتەڵەمیران. (ئەردە.) گەمەیەکە، یاریکەر، شۆخیکار، گەمەکار.

تەتک

**تەتن:** قوڕ.

**تەجەنەر:** سابرین.

**تەجە:** تەمژە، تگە، سابرێن.

**تەح:** پەح.

**تەحح:** پەحح.

**تەحت:** شاخ و چیای بەردین. (باک.) تات، بەردێکی گەورە و پانە کە هێندێکی لە خاکدابێ.

**تەحا:** تەها، تەححا، پەحا، پەححا، پەح. ئاها، هاها.

**تەححا:** پەححا.

**تەحاتەحا:** ئامرازی سەرسوورمان و واق وورمانییە.

**تەحر:** شێوە.

**تەحرە** (زا.): قرچەی نیوەڕۆیە.

**تەحسین** (باد.): پێ هەڵخلیسکان.

**تەحفیل** (زا.): شووشتنی چتی گڵاو حەوتجاران.

**تەحل** (باد.): تاڵ.

**تەحلەسیف** (زا.): جوورە کاڵەکە مارانەیەکە دەخورێ.

**تەحلک** (باک.): تاڵکە. کاڵەک و گرکەی نەگەیشتووە. (زا.) پیاوی ڕەشتاڵە.

**تەحلی** (زا.): گیایەکی تاڵە (ڕەنگەکە کرە بێ)، تاڵی، واژی شیرینی.

**تەحلیشک:** (باد.) تاڵیشک (گیایەکە). (زا.) ناوی تاڵی سووێر.

**تەخ** (باد.): دەنگێکە گاجووت و گامێشی پێ دەگێڕێتەوە.

**تەخار:** تەغار، پێوانەیێکی سی پەیییە.

**تەخاراو:** تەغاراو.

**تەخم** (باک.): (باک.) دەهەم. دەر، شوون، شوێن: بارام لقێ تەخمێ هات کوشتن: واتە بارام لەو دەهەمە، لەودەرە کوژرا.

**تەخمن:** تەغمن، گەلای داران و توورتنێ یا هەر چتێکی وەکوو وی بکەوێتە سەریەکتری و بپەستری، کە هەڵکەنرا بەتەختە هەڵبستێ ـــ ی پێدەڵێن. (ڕەوا.) تەرخ.

**تەخبەش:** (باک.) تەخ بەشۆ. ناوی گەمە و یارییێکی منداڵانە.

**تەخبەشۆ** (باک.): گەمەیێکی منداڵانە بەشەو منداڵان دەیکەن و پێیەوە هەڵدەپەڕن.

**تەخت:** تەختی میر و خونکار و پادشایان. پای ـــ : شوێنێکە، کە تەختی میری لێیە. تەختی نووستنێ: چارلنگ، هەرزاڵ. تەختی لەسەر دانیشتنێ، (لو.) چارپایە. تەواو، بێ کەم و کووڕی. ـــ بوون: تەواوبوون. ـــ کردن: تەواوکردن. زەوی یا سەربان یا چتێکی ڕاست و پان و ڕێک و پێک، (باک.) ئاران. قوولایی هەرشوێنێکی بە ئاو یا بە گڵ پڕبکرێتەوە دەڵێن ـــ کرا. ڕێک، تەراز، هامار. (باک.) تەختە. تەختی بووکێ، پەردەی بووکێ. پڕ، لیپا و لیپ، لچان. (هەورا.) تات، کچێکە پارچە گۆشت یا ئێسکێکی لە نێو ئەندامی شەرمی دابێ و پەکی کونکردنی بخات.

**تەختان:** تەختایی، ڕێکی. ـــ ی: زەوی ڕێک و پێک، تەخت. تەختایی.

**تەختایی:** ڕێکی و پێکی و ڕاستی ڕووکاری زەوی، تەختانی.

**تەختە:** نەرد، نەردان. مردیاک. (زاخۆ.) دەبک. (هەورا.) دیبەگ. (زێ.) دەپە. (هەورا.) باهوو. (باک.) دەپ، دارپاشین. (فە.) تەختەچوو. دارێکی پان و تەنکە سا درێژ بێ یان کورت. پارچەی دەوار و جاجم و پۆ پەشمین و بەرە و ئیتر کە لێک دەدرێن، بۆ وێنە دەڵێن دەوارەکە چوار تەختەیە. پارچە، ـــ زەوییەک: پارچە زەوییەک. بەستراو، داخراو، هەڵگیراو. بازاڕ ـــ کرا: بازاڕ بەسترا.

**تەختە ئەسن:** تەبەقەی ئاسن.

**تەختەبەرە:** تەژک، تەشکەبەرە. تاییژ.

**تەختەبەرد:** تات، بەردی پان، تەرت. چێل، تێت، تەڵبەرد، هیم، تەهت.

**تەختەبەن:** تەختەبەند.

**تەختەبەند:** تەختە پۆش. جوورە تەختێکی گەورەی بەرزە، ماڵ و منداڵ لەسەری دەنوون. ـــ ی: تەختە پۆش.

**تەختەبوون** (ڕۆژ.)**:** بۆ نەخۆشی کەوتن.

**تەختە پۆش:** تەختەبەند. گۆڕیچە و ناوی کارێزێکە نەملاولای بە خەرە بەردان هەڵچنرابێ و سەری بە تەڵبەردان داپۆشرابێ. سەرداری ڕایەی خانووان تەختەبەند کردن. ـــ ی: تەختەبەندی.

**تەختەتیرە:** تەختەساف، تەختەدەزی.

**تەختەچوو:** تەختە.

**تەختەدەرز:** تەختە.

**تەختەڕەوان** (باک.)**:** پەین و کاوکۆتێکی ووشکە بەژێر پێی ووڵاخ و ئاژاڵاندا دەکرێ. کەژاوە.

**تەختەزەنگ:** پارچە ئاسنێکی هەڵاوەسراوە لە قوتابخانە و کارگاندا جارجار لێدەدرێ بۆ دیارکردنی کات و پشوو.

**تەختەساف:** (فە.) تەختەتیرە. (کۆ.) تەختەگوش، قووش. (بابا.) کندر. (بۆل.) گوشیلە. پەلووکە. گووی کەتە. تەختەدەزی. تیرە.

**تەختەسر:** پەڕۆ یا چتێکە گێچی سەر تەختەی ڕەشی پێدەستردرێ.

**تەختەسیاو:** تەختەی ڕەش.

**تەختەسیە** (فە.)**:** تەختەی ڕەش.

**تەختەشەترنج:** تەختەی شەترنجی.

**تەختەشۆ:** تاتەشۆر.

**تەختەشۆر:** تاتەشۆر.

**تەختەقیمە:** تەختەی قیمەی.

**تەختەکالیسی** (کۆ.)**:** زیندەوارێکە وەکوو پند وایە بەڵان گەورەترە، کە بەلەش هەڵبگەرێ خارشتی پەیدادەکا وە نیسکی دەچێ بەڵان ڕەشتر و تەنکترە.

**تەختەکوچک** (ئەردە.)**:** تەلەسەنگ. تەختە سەنگ.

**تەختەگووش** (کۆ.)**:** تەختەساف.

**تەختەمەشق** (ئەردە.)**:** تەختەی ڕەش.

**تەختەنەرد:** تاوڵە.

**تەختەی ڕەش:** (باک.) دەپڕەش. (هەورا.) تەختەی سیاو.

**تەختەی قیمە:** تەختەقیمە.

**تەخت بوون:** ڕێک بوونی شوێنێک، کە مەبەس لە نەمانی گرێ و قۆرت و بەرهەڵستیشە لە کارێکیدا.

**تەخت خاو** (ئەردە.)**:** تەختی خەو.

**تەخت ڕەوان** (ئەردە.)**:** تەختەڕەوان. تەختی ڕەوان.

**تەختک** (باک.)**:** چوارپایە.

**تەختکردن:** ڕێک خستنی شوێنێک و پڕکردنەوەی شوێنە نزمەکانی و نزم کردنی بەرزاییەکانی. بەزەوی دادانی یەکێک.

**تەختگا:** شوێن و جێگای تەختی میر و خونکار و پادشایان. پایتەخت.

**تەخت ووتەی** (هەورا.)**:** تەختی نوستن.

**تەختێ بەنەفشی** (باک.)**:** جوورە کرا (بووزوو) یێکە.

**تەختی ڕەوان:** کەژاوە، کە دوو چاوەی گچکەیە لە پشتی ووڵاخی بەرزە دەکرێ و لە هەر چاوەیدا یەکێکی تێدا دادەنیشێ سا پیاوێکی گەورە یا بووک. ئوتومبیل، گالیسکە.

**تەختی نووستن:** تەختی خەو.

**تەخدەمە** (زا.)**:** بەرکوت.

**تەخر** (ئەردە.)**:** هێشتن. بەجێ هێشتن، لابردن، وازلێهێنان.

**تەخسیر** (زا.)**:** نچەتا.

**تەخش** (کەل.)**:** تیر یا چتێکە باوێژرێ و لە نیشانە بدرێ.

**تەخشان:** پەخشان.

**تەخشان و پەخشان:** بەشینەوە، دابەشینەوە.

**تەخشەلاکوم :** جووڵەجووڵ، بزووتن.

**تەخشک** (باد.)**:** ڕفحە، ڕفەی سەرتاق.

**تەخلیت** (زا.)**:** جوور، چەشن.

**تەخم** (باک.)**:** (باک.) تەخمە، دەهەم. دەر، شوێن، جێگا.

**تەخمین:** مەزندە، گۆترە، دەمبڕ. لێکدانەوە.

**تەخنک** (زا.)**:** لەنگەری.

**تەدارەک:** (باک.) تەپتەپ. ڕێک و پێک، ئامادەیی، کارسازی. تفاق (زێڕ و ماڵ و کەل و پەل). ـــ گرتن: ڕازاندنەوە، دروستیا. جووەکرن.

**تەدارەک کردن:** ڕێک وپێک کردن، ئامادە و کارسازی کردن. تفاقگرتن، تفاق خستن.

**تەر** (هەورا.)**:** تر، ئیتر، دی، ئیدی، ئیدیکە.

**تەڕ:** غدار، شێ دار، هێمی، (باک.) تەڕاهـ. شل، ئاوی، ئاڤی، غاوی. واژی ووشکە بەهەمموو چتێکی وا دەڵێن، کە تەڕایی هەبی یا ئاوی وێ کەوتبێ وەکوو داری تەڕ یا بەرووکالا و خۆڵێکی ئاوی گەیشتبێتێ. ئاوەکی، تەڕوتوول، شل. سەوز. دار و گیا تەڕن واتە سەوزن. ووڵاخ و ئاژاڵی ـــ خۆر: شینایی خۆر، گیا خۆر.

**تەڕا** (باک.)**:** بۆ تۆ، لۆ تۆ.

**تەڕبوون** (زا.)**:** کەوتنە خوارەوە لە بەرزییەوە.

**تەڕات** (جا، هەورا.، شار.)**:** شەرنەخێوی، تەڕاد، تەڕاتێن، سەلەفکردن و تاودان، غاردان.

**تەڕاتی** (باک.)**:** تەڕایی، تەڕی. فێنکی.

**تەڕاتێن** (شا.، هەورا.، جا.): شەڕنەخێوی، هێنان و بردنی وولاخی سواری بەغار. خور، تەراد. پێشبڕکە (بۆ سوواران).

**تەڕاج** (هەو.، کە.): کڕیار و فرۆشیاری دەغڵی یا دار و خەڵووز بە کۆمەک بکڕی و بفرۆشیّ. (جا.، هەورا.) کاریتە.

**تەڕاخ:** تاق، تاک، تاک و تەراک، تاق و تەنیا.

**تەراخومە:** (باک.) بەترە. نەخۆشی تووشی دیوی ژوورەوەی پێڵووی چاوان دێت و پەرەئەستێنیشە.

**تەراد:** (هەو.، جا.) تەڕاتێن. (موک.) شەڕنەخێوی. تەرات، ڕەمبازی کردنی چەند سووارێک. نەرمە غاری سووارانە لەپێش بووکاندا یا لەپێش دەستە سووارێکیدا یا بەتەنهایی. (موک.) گۆشتە نەرم و چەقالتە تەنکەکەی سەر پەراسووانە، (دەر.) تەراف. (کۆ.) ئاتەگ، ئەتەگ. تەرۆک، تەلۆک. سمت.

**تەرار** (باد.): بادی ناوخواردنەوە.

**تەراز:** ڕێک، بەرانبەر، جووت، ڕێک و پێک. هێندەی یەکتری، (دەر.) دەرانەوەر. (ڕۆژ.) خوواستنەوەی ئاژاڵە بۆ بەشە ڕۆن و دۆشین، کە تەنها بۆ مانگا بەکاردەبریّ بۆ مەڕ و بزن دەڵێن (شووانکارە). (باک.) سەوزی، تەڕی، بەروبوو، داهات.

**تەرابوون** (باک.): کەوتن، کەوتنە خووارەوە، بەربوونەوە.

**تەرازن** (هەورا.): زۆنگی ئاودار، قۆپیە، قۆپی، زناو.

**تەرازن:** (جا.) گیایەکە هەمیشە شینە. (باک.) قوللە و سەر تەپەڵۆکی تۆقەسەری چیایان.

**تەرازوو:** ترازوو، شایەن. (هەو.، خۆ.) تەرازی. (هەورا.) ترازی. کۆمەڵە ئەستێرەیەکیشە، کۆمکا سێویا. بەرانبەر، تەراز، تەخت، هامار.

تەرازوو

**تەرازووباز:** ترازووباز.

**تەرازوون** (باک.): لە کاتی تووانەوەی بەفری زەوییە، کە بەچیمەن داپۆشرابیّ.

**تەرازی** (هەو.، خۆ.): تەرازوو. کۆمەڵە ئەستێرەیەکیشە، کۆمکا سێویا.

**تەرازیا:** شەونم.

**تەراش:** (ڕۆژ.) تراش، تاشینی ڕیش و سەر. ـــ بووم، ـــ بووی، ـــ بکە. (خۆ.، هەو.، دەر.، بار.) بنە دارێکە چەند لکێکی لە عەردییەوە پێکەوە ڕووابیّ.

**تەراش:** تەلاش، تیغە.

**تەراشتن** (باک.): تاشین، تراشین.

**تەراف:** کەفەل، ئەقیز، گاز.

**تەراف** (ئەردە.): سمت، کەفەل.

**تەراف:** (دەر.) تەراد (گۆشت)، (ئەردە.) گۆشتی سینگ. (باک.) خوڵەمێشی گەرم، زیلەمۆ. (زا.) قوناری مێو. پارچە گۆشتێکی تەنکی پانە لە نێوانی ڕیخۆڵە و جەرگ و سپیەلاکیدایە. گۆشتی هوڵۆڵی (بۆشایی) خووار کەلەکە. بۆشایی نێوانی پەراسوو و کەلەکەیە، کلۆک.

**تەرافکرن:** بڕینی ڕەز و باغ.

**تەرافی** (باک.): دارێکە.

**تەراکرن** (زا.): هاوێژتنی چت لە بەرزییەوە بۆ خوواریّ. خستن، بەردانەوە، خستنەخووارەوە.

**تەرال** (ئەردە.): تەمبەل.

**تەرال** (باک.): (باک.) تمبال. تەمبەل.

**تەرالی** (باک.): (باک.) تمبالی. تەمبەلی.

**تەرانە:** قەشمەری، گەپ، گەمە، (ڕەوا.) تیز، یاری، گاڵتە. گۆرانی، بستە، لاووک، لاووژە.

**تەراو:** سپیکردنەوەی ناومال بە لیتاوی گڵی سپی.

**تەراو بەربوون** (باد.): پەرش و بلاوبوون.

**تەراووز:** تەراووس.

**تەراووس:** تەراووز. دووای پەڵە دەغڵ چاندن. زەوییێکە هارینانیش غێکی تەرایی هەبیّ.

**تەراە** (باک.): تەڕ. ـــ ی: تەڕی، تەڕایی، تەڕێتی. شیناوەردی تەڕ.

**تەراییتی:** تەڕێتی، تەڕی، ڕەوشە، تەڕاتی،نم، (باک.) تربووس.

**تەرایی:** تەڕی، تەڕاتی، نم، تەڕێتی، ڕەوش، (باک.) تربووس. شووێنی تەڕ.

**تەڕە:** سەوزی، سەبزی، سەوزەوات. تەرەکاری و میوە.

**تەرە:** تار، ئاوارە، دەربەدەر. ـــ بوون: تاربوون. ـــ کردن: دەربەدەرکردن. ترێ و میوەییێکی بۆ میلاق ئامادەدەکریّ لە پێش هەلاوەسینیدا لەسەر پووش و گەلا و چتی وای هەڵدەخەن تا کەمێک سیس دەبیّ. ترێ و میوە لە ـــ دان: بەو کرداره دەڵێن، کە باسکرا. گەلای تووتنیّ، کە پۆقژەی زەردی دەرکرد لێدەکەنەوە و گەلا لێکراوەکانی تووتنیّ زۆری پێکەوە دەنووسێنن و دەمارەکەی لەسەر زەوی دادەنێن لەناو جۆگەیەکیدا، کە پنگی تێدا ڕاخرابیّ و سەرەکەشی بە پنگی و چرووی دادەپۆشن لە نێوانی سێ تا حەوت ڕۆژان دەمێنێتەوە ئەوجا دەریدێنن و بە ڕستەیەوە دەکەن یا دەیکەنە دەستەو شیشەی تێ هەڵدەکێشن، پنگەکەی سەر و خوواری ناو جۆگەکە بۆنخۆشی دەکات.

**تەرەبار** (ئەردە.): میوە و سەوزییەکە، کە دەخورێن.

**تەرەبنە** (ئەردە.): جوورە گیایەکە ئاژاڵ دەیخووا.

**تەرەبێ:** بی تەڕ.

**تەرەبیرۆ:** بیرۆیەکە تەڕبیّ.

**تەرەپەنە:** گیایەکی خواردەمەنی ئاژاڵییە.

**تەرەپیاز:** تەرەپیواز. پیوازی سەوزی گەلادار.

**تەرەپیواز:** تەرەپیاز بە گەلای سەوزەوە.

**تەرەتەوەن** (هەورا.): دارێکی گەلا ووردی بەقەد داری بەلاڵووکێیە بەرز دەبیّ لە چیایاندا لەناو بەرداندا دەردەچیّ و ناشکیّ، کە بتەویّ بیشکێنی لقەکەی با دەدریّ بە بەردی لێی دەدریّ و دەپسیّ لە سووتانیشدا لە دار لە سۆبەیدا درەنگتر دەسووتیّ بە ووشکی.

**تەرەتوو:** تووی تازە و تەڕ.

**تەرەتەوەن** (هەورا.): بەردی تەڕ. نێوی دێیەکیشە لە نزیک سەید سادق.

**تەرە توورە** (هەو.): تەرەتیزە.

**تەرەتۆڵەکە:** بریتییە لە چتی هەرزان: گەنم بووە بە تەرەتۆڵەکە. (ئەردە.) نانە لەگلەگ، نانی حاجی لەگلەگی. هەرزان، چتی زۆرو

کەم نرخ.

**تەڕەتیزە:** (هەو.) تەڕەتوورە. (باک.) تەڕەتوورە. گیایەکی گەڵاّ ووردی توندە بە گۆشتەوە دەخورێ.

**تەرەجە** (لو.): تاق.

**تەڕەدووا** (ئەردە.): تەرەکردن، ڕاونان.

**تەڕەدین** (باک.): هەڵەشە، حولحولی، دەلووکار، کەمهۆش، گێل.

**تەرەز** (باک.): تەرزە.

**تەرەزای:** تەڕەزەن.

**تەڕەزەن:** وولاّخ یا ڕەشەوولاّخێکە بەری هاوێژتبێ یا تازە زابێ و شیری زۆر بێ. تەڕەزای، تازەشیر. بە جنێو بۆ مرۆڤیانیش بەکاردەبرێ. مانگا یا گامێشێکە ووشک نەکات تا بەسەردا دەزێتەوە. گیایەکی کوێستانی بۆنخۆشە بۆ مەڕ زۆرباشە.

**تەڕەژەن** (ئەردە.): تەڕەزەن.

**تەرەس:** گەواد، دەویت، قوڕمساخ، مرۆی بێ ئابروو و بێ ناموس، بێ ئایین. بۆ جنێویش بەکاردەبرێت تەنها بۆ پیاوان. (باک.) فریودراو.

**تەرەساز:** شێلم و گەفەکوتاوی تێکەلاّو دەکەن تا هەفتەیێکی ناوی ـــ ە، کە کرا بە سەلک دەبێتە ترخێنە. جوورە ترشێکە لە سەلکی شێلم و بروێش دروستدەکرێ.

**تەرەسال:** ساڵێکە بەفرو بارانەی زۆر بێ و پەڵەی زوو دابێ و کانیاوەکانی باش تەقی بن.

**تەرەسلێمانە** (ئەردە.): جوورە گیایەکە خۆراکی ئاژالاّنە.

**تەرەفاندن** (باک.): بەلکردن، بڕین، قەدکردن. بتەرفینە: بەلکە، ببرە.

**تەرەفـە** (باک.): مرووموووشکەر، لاپرسەنی، پلەندەر، مووشەک. کەسێکە لێرە و لەوێ جەم بەسەربات.

**تەرەفرۆش:** کەسێکە میوە و سەوزەی بفرۆشێ. سەوزی فرۆش. ـــ ی: سەوزە فرۆشی.

**تەرەقە:** چەشنی چەکان، چتێکە وەکوو پوولەکە بەسەر قەوانی فیشەکەوە بە تروکاندنی دەمانچە و تفەنگ دەتەقێنرێت.

**تەرەک** (ڕۆژ.): دەرز، درز، قەڵشت، تەرەک.

**تەرەکار:** تەرەکاڵ. کەسێکە پیشەی باخچە و شیناوەردی ڕەنێوهێنان بێ. ـــ ی: تەرە، بریتییە لە هاروێ و ترێزوو و کاڵەک و شووتی و گرکە و خرچە.

**تەرەکاڵ** (ڕۆژ.): شینایێکە لە پاش بارانەی کێڵرابێ و چێنرابێ. گەفی بەراو، ئاوەنیا، بەراو، تەرەنیا.

**تەرەکان** (فە.): قەڵشین.

**تەرەکە** (باک.): تەراهی.

**تەرەکین:** قەڵشینی پێست. ترەکین، ترکان.

**تەرەلەیلان** (هەو.): نێرتکە پیواز.

**تەرەماست** (باد.): کەرە، سەرتوێی ماست و شیرە، کە لە پاییزاندا چین چین لە دیزە یا لە پێستەدا دادەنرێ و لە زستاناندا دەخورێ.

**تەرەماش:** چتی هیچ و پووچ، ترەماش (جنێوە). ـــ ی خواردووە: واتە چتێکی هیچ و پووچی خواردووە. فەریکە ماش، ماشی تەڕ.

**تەڕەماڵە** (ئەردە.): هێڵەسا و کردنی سوواخی دیوار و ناوماڵ و شووێنی گەنم لەسەر هەڵخستنی لەپاش شۆردنەوە.

**تەڕەماڵێ** (ئەردە.): تەرەماڵەکردن.

**تەرەمێر** (باک.): پیاوێکە زۆر بەدەوری خۆی هەڵبێ و خۆی جوانکا و خۆی برازێنێتەوە.

**تەرەنداز:** تەرپۆش. ـــ ی: تەرپۆشی.

**تەرەنیا:** (ڕۆژ.) تەرەکاڵ. زەوییێکە ئاوداربێ یا بارانەی بەسەردا بارییێ ئەوسا کێڵرابێ.

**تەڕەوکردن** (ئەردە.): تەرکردنەوە.

**تەرەوون:** دارێکی گچکەی تاڵی ئاوییە.

**تەربوون:** شێداربوون، غەدار و ئاوی بوون. عارنان و پەند وەرگرتن، دەڵێن فیسارەکەس هەرگیز تەرنابێ، هەر لە نەبووندا بەکاردەبرێت.

**تەربوونەوە:** مەبەس لە ژن هێنانی پیاوێکی بەساڵدا چووە لەپاش مردنی ژنی پێشووی یا تەلاقدانی .

**تەربی:** دارێکی کوێستانییە هەمیشە سەوزە بەرێکی خڕی سووری هەیە وەک بەلاّلووک بۆ ڕەوانی دەخورێ.

**تەرپ** (باک.): تەپ. دەنگی لێدان یا کەوتنی چتە.

**تەرپلاندن** (باک.): خۆلێدان، ئازارکردن، هەڵەنگواندن، سەرسم پێدان. بتەرپلینە.

**تەرپلین:** (باک.) خۆلێدران، ئازارکران. (زا.) سەرسمدانی وولاّخ. هەڵەنگوتن.

**تەرپۆش:** کەسێکی بەساڵاچووە، کە بەرگی تەڕ و جوان لەبەر بکات. ـــ ی: بەرگی خاوێن و جوان لەبەرکردنی پیران.

**تەرپیر** (باک.): پیری دڵتەڕ. ـــ ی: دڵتەڕی لەکاتی پیریدا.

**تەرپین** (باک.): تەقەییێکی ڕێک و پێک و پوختە.

**تەرت** (باد.): کەستەک، سندەگڵ.

**تەرت** (خۆ.): تات، بەردی پان.

**تەرتەلە** (باک.): ڕاوەستان، وەستان، بەپێوە ڕاوەستان.

**تەرتەلەمان** (باک.): مانەوە بۆ لێکدانەوە.

**تەرتەوەرتـە** (ڕۆژ.): تەفروتوونا، تەرت و توونا. ـــ بوون: تەفروتوونابوون. ـــ کردن: تەفروتووناکردن.

**تەرتلاندن** (باک.): گێژکردن، سەرلێشێواندن. بتەرتلینە.

**تەرتلین** (باک.): گێژبوون، شێوان. بتەرتلە.

**تەرت و توونا:** تەفروتوونا.

**تەرتوورە** (باک.): تەڕەتوورە.

**تەرتوول** (زا.): هارپە.

**تەرچک** (جا.): ناسک، شلک، تەڕوتازە (بۆ چتی خواردەمەنی). گیای تازە دەرهاتووی ناسکی تازاو.

**تەرح:** جۆر، تەحر، چەشن. شووتی نەگەیشتوو.

**تەرحەک:** کۆڵەدروو.

**تەرحی** (زا.): سەرپۆشی ژنان.

**تەرخ** (ئەردە.): تەخر، جێ هێشتن، بەجێ هێشتن. (ڕەوا.) گەڵای توو تن یان هەر چتێکی وەکوو وی بکەوێتە سەریەکتری و بە تەختە هەڵبستێ. تەخەن. (ڕۆژ.) چەشن و ڕەنگی میوەی دووایی باخ و باخچانە. (باک.) بێش. سەرانە، باج و خەراج، تەخمین.

**تەرخان:** سەرپشک، ئازاد، ترخان، ناڤبر، نێڤچی. ترخێنە. ـــ کردن: کردنە تایبەتی، دیاریکردن، هەڵبژاردن، ئازادکردن. قەدەغەکردنی چتێک بۆ کارێک یا بۆ شووێنێک. شووێنێکە تەرخانکرابێ بۆ مەبەستێ، ئەم زەوییە تەرخانکراوە بۆ مەرەزە دانران، وازلێهێنران.

**تەرخانی:** تیرەیەکە لە هۆزی جاف.

**تەرختە** (ئەردە.): بڕبڕەی پشت.

تەرختە

**تەرخوون:** گیایەکە لە نێو ماست و دۆکوڵیو و تۆراخی دەکرێت گەڵای باریکە تامی خۆش و توندە بە گۆشتیشەوە دەخورێ.

**تەرخێنە** (ڕۆژ.): ترخێنە.

**تەڕدەس:** تەڕدەست.

**تەڕدەست:** تەڕدەس، بەدەست و برد، گوستاخ، چالاک، توندوتۆڵ، چوست، گورج و گۆڵ، چاپوک، زرنگ. کەسێکە دەست و برد بێ لە کاراندا. ـــ ی: تەڕدەسی، چالاکی، توندو تۆڵی. چوستی. چالاکی و توندوتۆڵییە لە ئیش و کاراندا.

**تەڕدەسی:** تەڕدەستی.

**تەڕدەم:** کەسێکە قسەزان و قسە ڕەوان بێ. تەڕزووان.

**تەڕدەمی:** قسەزانی، قسە ڕەوانی، تەڕزووانی.

**تەرز:** توولەی دارە مێو و برکەی خەیار و ترێزوو و کاڵەک و شووتی و گووژاڵک و ئیترە. شێوە، چەشن، بابەت، مەهوار، جوور، ڕەوشت.

**تەرزە:** (دەر.، جا.) تەزرە. (ڕۆژ.) تەگر، تەگەر. (فە.) تگر. (باک.) تەرەز، تەرک، خرخرۆک. (هەس.) تەیرۆک. (بۆتا.) تەرگ. (باد.) تەوەرگە، گژک. (بار.) غولۆلیک. (باد.) ترگژۆک. (باد.) زیپک، گژلۆک.

**تەرزەشکێن:** تەرزەکوت.

**تەرزەکوت:** تەرزەشکێن، کشتوکاڵ یا چتێکە تەرزە کوتابێتی و لە کاری خستبێ. مەبەس لە بەسەر ڕۆیشتن و ئامۆژگاری یەکێکییە پەیتاپەیتا یەک لەسەر یەک، ـــ دایگرت.

**تەرزەکوولەکە:** توولەی کوولەکە.

**تەرزەی گەورە:** گاریسۆک.

**تەرزە لووکە:** گلێرە. نە وەکوو بەفری نەرمە و نە وەکوو تەرزەی ڕەقە و زۆر زوو دەتوێتەوە.

**تەرزەنوو** (باک.): وەڵام، دەنگ، دەنگ و باس، چتی تازە و نووێ.

**تەڕزمان:** تەڕدەم، کەسێکە قسەزان و قسەڕەوان بێ. ـــ ی: تەڕدەمی، قسەزانی، قسەڕەوانی.

**تەرزۆ:** نێوی ئافرەتانە.

**تەڕزووان** (ئەردە.): تەڕدەم، زوواندار. ـــ ی: تەڕدەمی، زووانداری.

**تەرزی** (باد.): بەرگدروو.

**تەرس:** (ئەردە.) تەرسەقول هی کەر و ئێستر و ئەسپ و ماینانە، (ئەردە.) سەنیر. (هەو.، هەورا.) قەرسەقول. بەرواژی، پێچەوانە.

**تەرسا:** فەلە، دیان.

**تەرسایی:** فەلەیی، دیانی، عیسایی.

**تەرسە:** (ڕۆژ.) ئاوەژوو، بەرواژی، وازی. (ڕۆژ.) گەمە، گاڵتە، قەشمەری.

**تەرسەزاڵ** (هەورا.): ترسەنۆک.

**تەرسەقول:** تەرس، (شا.) تەرسەکەڵ. (هەورا.) قەرسەقول. (بابا.) تەرسەکەر. پیسی چارەوێ (تەنها هی کەرانە).

**تەرسەکەر** (بابا.): بڕوانە: تەرسەقول.

**تەرسەکەڵ** (شا.): تەرسەقول.

**تەرسنای** (هەورا.): ترساندن.

**تەرسنەر** (هەورا.): ترسێنەر.

**تەرسی** (باک.): ووشکی، ئیشکی (بۆنان). (فە.) ترسێن، ترسێنەر.

**تەرش** (باک.): ئاژاڵی وورده، مەڕ و بزن و ڕەشەووڵاخە.

**تەرفە** (ڕۆژ.): تەفرە، فریو.

**تەڕفرۆش:** تەڕەفرۆش. ـــ ی: سەوزە فرۆشی، تەڕەفرۆشی.

**تەرفک** (باد.): پارچە گوریس.

**تەرفین** (باد.): چاو ئێشان بە هۆی ئەوەوە، کە چتێکی تێکەوتبێ.

**تەرق** (باک.): تەق، تەقە، تەققە.

**تەرقال:** هاوالایەتی برادەری خراپ. برادەرایەتی یەکێکی بەدکردار.

**تەرک** (خۆ.): داری سووتاندنێ، کە تەڕ و ئەستوور و براوبێ.

**تەرک:** دەمار وەرگەڕانی شان و قۆڵی ووڵاخییە وەکوو قۆڵنجی مرۆیان وایە. (هەورا.) تەشک. خشڵی ژنان. (باک.) کوڕادە. (کە.) پاشکۆ، تەرکی. (مەک.، باک.) تەرۆک، پاشتەرک. جێگای پاشکۆیە لە پشتەوەی زینی. خشڵی ژنان. نیوتەرک، تەواو تەرک. بەشەکانی کڵاوی دەروێشانە. (زاخ.) تەرزەی گەورە. تەنیشت. تەرزەی دەنک گەورە. بڕین و دڕینی چت بە باری درێژیدا. چەکی شەڕێ. هەرە بنەڕەتی خاکی ڕەق و زیندووە، دەڵێن بناغەکە گەیشتۆتە تەرکی واتا گەیشتۆتە ئاستی پتەو و قایم. تەک، بنەڕەت، بن بنەوە، ژێر، بەش، نزمی.

**تەرکە** (ڕۆژ.): جوورە گیایەکە وەقامیشی دەچێ قاقەزی لێدروست دەکرێ. (ڕۆژ.) گابڕ. پیکە، نەیجەیێکە دەکرێتە چیغ. توولی تەڕ، توولەی تەڕ. (ئەردە.) شووڵ، توول، لق، لک.

**تەرکەخەم:** گووێ نەدەر، بێ خەم.

**تەرکەخەمی:** خستنە پشتگووێ، دانە پشتگووێ. (باک.) کاسوولی کردن.

**تەرکەز** (لو.): حەیزەڕانی ڕمبییە. تەرگەز.

**تەرکبەن:** تەرکبەند، پاشکۆ، تەرکی، بەن سامۆتە.

**تەرکبەند:** بەن سامۆتە.

**تەرکردن:** بە ئاوکردن، شل کردن.

**تەرکردنەوە:** لە بەهاراندا لە جیاتی کا و جۆ. گیا بە ووڵاخی بەرزەدان.

**تەرکزە** (هەورا.): بقە، ترکزە.

**تەرک کەوتن:** لە جێ چوونی دەستی کەر.

**تەرک و تووز** (ئەردە.): قەلاّفەت.

**تەرکی** (کە.): پاشکۆ، تەرک.

**تەرکی بەس** (ئەردە.): بەن سامۆتە.

**تەرکی بەن** (ئەردە.): تەرکبەن.

**تەرکی بەند:** تەرکی بەن.

**تەرکی بن بەرەی:** پاشکۆی بن بەرەی.

**تەرگ:** تەرزەی گەورە. (هەورا.) تەوەرگ.

**تەرگەز** (زەن.): دارێکە وەگەزی دەچی بەلاّن زۆر بڵندترە، حەیزەرانی رەببی. (لو.) تەرکەز.

**تەرگزە:** دانەیێکە لە نێو داوو تەڵەو فاقەیدا. تەلەزگە، بقە.

**تەرگزۆک** (باد.): تەرزەی چکۆڵە. گلێرە.

**تەرلان:** (باک.) پیاوی جحێڵ و جوان و لاو و شۆخ و شەنگ. شاواز، بازی گەورە، شاهێن، شاباز. (موک.) باڵندەیێکە راوەکەوی پێدەکرێت.

**تەرلە:** گیایەکی بەهارییە لە نێو دار و دەوەنـاندا دەڕووێ و بە سەوزی دەخورێ.

**تەرم** (باک.): جەنازە، بەشی، بازە، چەندەک، لاشەی گیانداری مردوو. خەوی ئاڵۆز و پەرێشان. خەوتەوانەی گەورە. گۆلیتی مێو.

**تەرماڵ** (زا.): کەفەڵی گیاندار. شیوە و کالاّ.

**تەرمی مەخێل** (باک.): وورچی هەرەگەورە.

**تەرن:** زیان گەیاندن بە یەکێک بەبێ ئەوەی، کە خۆی پێی بزانێ: فیسارەکەس ــ یێکی پێدام. فیزو، خۆڕایی. بە ــ دووکانەکەم لە دەست چوو.

**تەرن پێکردن** (سل.): دەست برین، لە خشتەبردن.

**تەڕۆ:** نێوی کوڕانە.

**تەروو** (ڕۆژ.، هەورا.، جا.): داری کفرە. (شار.، هەورا.) پەسیسە. تێروو، تەربی، تەڕەوون.

**تەڕواڵ** (ئەردە.): تەڕەواڵە، تەڕواڵە، هەرزاڵ.

**تەڕواڵە** (هەورا.): هەرزاڵ، کەپرێکی گچکە و نزمە لەناو ماڵدا بۆ لە سەر هەڵچنینی تفاقی ناوماڵ بەلاّن، کە لە دەرەوەی ماڵ یا لەناو باغ و باخچە و پەرێزاندابێ پێی دەڵێن کوندەلاّن.

**تەڕونیشکانێ** (هەو.): گەمەیێکی کوڕ و کچانە.

**تەڕوەندە:** چتی نایاب.

**تەڕوبر:** چتێکی تەڕی وایە، کە ناوی لێ بتکێ.

**تەڕ و تازە:** پاراو، شەپاڵ، تەڕچک. چتی تازە و نووێ.

**تەڕوتفاق:** ڕەخت، تفاق.

**تەڕووتووشی:** کاتی باران و قوڕ و چڵپاو، قوڕ و باران.

**تەڕوتۆل** (باک.): باریک و ناسک.

**تەڕۆزی** (هەو.): تریزوو، ترۆزی.

**تەرووزی** (هەورا.): ترێزوو.

**تەروشقە** (فە.): تریشقە.

**تەڕۆک:** تەڕاد. تەرکی وولاّخی.

**تەرووکووێستانی:** تێروو (دارێکە).

**تەرە** (باک.): دەوەن، داری چکۆڵە.

**تەری** (باک.): کلکی سەگ و ئیتر، دووف. کلێنچکە. دووگ.

**تەڕی:** تەڕایی، تەڕایەتی، غەداری، هێولی. (باک.) تەریتی. هێمیتی.

**تەڕیانە** (هەورا.): تریان. سەوەتەیێکە لە شووڵ دروستکرابێ.

**تەریە** (ڕۆژ.): جەردە، ڕێگر، (ڕۆژ.) تەریدە.

**تەریب:** جوورە دروومانێکە سەری دوو پارچان پێکەوە دەدروێن. چەپ و چێر بەسەر (باریکە) و (جوستە) دا دەڕوات.

**تەریبدان:** دروونی چت بە تەریب.

**تەریدە** (ڕۆژ.): جەردە، ڕێگر.

**تەریدەیی** (ڕۆژ.): جەردەیی، ڕێگری.

**تەریزە:** هوڵۆڵی (بۆشایی) کەلەکە.

**تەریساڵ:** (ئەردە.) تەڕیاساڵ.

**تەریش** (خۆ.): تەلاّشی داری، پارچە. تیکەی نان و چتی تر. (باک.) بەردی ڕاخراوو دانراو.

**تەریشۆ** (باک.): کەسێکە جلکی کۆن و پیس و دڕاو لەبەر بکات.

**تەریفە:** (دزە.): نەخۆشیەکی وولاّخ و ئاژاڵانە تووشی سیپەلاکیان دەبێ و نوختە نوختەی وەکوو خرۆرکەی دەردەکات. دەرد و ئازارێکە، کە لە تینوان تووشیان دێت و چاویشیان بێ تین دەبێ. (هەورا.) تریفە.

**تەریفین** (باد.): تووڕەبوون، کین بوونەوە. ڕق هەستان.

**تەریق:** شەرمەزار. ــ بوونەوە: شەرمەزاربوون، تەریقەوەبوون. ــ کردنەوە: شەرمەزارکردن.

**تەریقە** (ئەردە.): چەشنی، چاشنی.

**تەریقەوەبوون:** شەرمەزاربوون، تەریق بوونەوە.

**تەریقکەرەوە:** ڕووشکێن، ترشکێن، بەخۆدا شکێنەوە.

**تەریقی:** شەرمەزاری.

**تەریک:** کەلێن، گۆشە. گۆشەگیر، خۆ دوورخەرەوە. کلا. کەسێکە یا شوورتێکە کەوتبێتە لاوە.

**تەریکی:** گۆشە گیری، کەنارەگیری.

**تەرینە** (هەورا.): دارێکی کوێستانییە گەلاّی لە گەلاّی هەنار ووردترە و زۆر تاڵە بەرەکەی وەرێزەڵەی دەچێ بۆ ژانە زگ زۆر باشە.

**تەریوی** (باک.): جوورە ماسییەکە.

**تەز:** تەزوو، تەزگ، سڕی، گۆتی، مووچرک. تینێکە بە لەشدادێت.

**تەزان:** سڕبوون، تەزین، بێ هەست بوون.

**تەزاندن:** سڕکردن، بێ هەست کردن، قەفلاّندن، ئازاردان و دڵگیرکردنی کەسێک بۆ چاوترساندنی. (باک.) فرین بەبێ ئەوەی باڵ بجووڵێنی بە لەنگر لە هەوادا ڕاوەستان. ساردکردن. بەهۆی سەرما و بەفر و بارانەوە ئەندامی لەش سڕ و بێ هەستکردن.

**تەزانن:** تەزاندن. دەردەسەریدان.

**تەزای:** تەزاو.

**تەزە** (هەورا.): تەزین. (باک.) تازە، نوێ.

**تەزەرد** (هەر.، خۆ.): مەڕ، کاوڕ یا بەرخێکە دەم و چاوی زەرد و لەشی سپی بێ.

**تەزبیح:** تەسبیح، پسپسۆک. بەرمووریێکە مووروو لە زێڕ دەگیرێ یا پڕپرەشی هەیە.

**تەزرە** (جا.، دەر.): تەرزە.

**تەزگ:** تەزوو. تەرزەی دەنک گەورە.

**تەزوو:** مووچڕک، تەز، تەزی، سوو، کەلیژ، شەوت، کاری. ــ پێداهاتن: تەزی تێڕۆبوون لە ترسان. تاقۆیی، سۆز. مووچڕکێکی بێ پەروایە دێ بەسەر ئەندامی گیاندارانداا لە سەرمان یا لە ترسان یا لە بیستنی کرڕەی هەندێ چتەوە. هەوا، سوو. ــ ی سارده: سووی سارده. ــ ی گەرم: هەوای گەرم، سووی گەرم. تەرزە.

**تەزی:** تەزوو. (باک.) گوشاد، درێژکراو، (باک.) تەیز. (باد.) چتی زۆر سارد.

**ئاڤاتەزی:** ئاوی سارد.

**تەزیگ:** تەزیو، گۆت، سڕ.

**تەزین:** گۆت بوون، سڕبوون، بێ هەست بوون، سڕبوون لە سەرمان یا لەبەر زۆر قورسایی خستنەسەر ئەندامی یا لەسەری دانیشتن. لە لێدانێدا تەزین.

**تەزیو:** ڕچیاو، چیاو، سڕ، بێ هەست. شلەمەنییێکی زۆر ساردە.

**تەژ** (باک.): پڕ، تەژی، تژی.

**تەژاندن** (باد.): کوشین، گوشین. دەستیم تەژاند: دەستیم کوشی.

**تەژە:** (باد.) هۆڵکردن، قەلەمندار لە گۆیێنێدا مندالان، کە گۆیەکەیان لێکەوتە نێو جەغزەوە دەڵێن تەژە بوو، بەو هۆیەوە گەمەکە تێکدەچێ دەبێ دووبارە بیکەنەوە. (جا.، کۆ.) کاریتە. (هەو.، خۆ.) دارێکی کورت و ئەستوورە بەهۆیەوە سەری کاریتان بۆ سەر دیواران بڵند دەکرێت. (خۆ.) ئالوودار، رایەڵی بن میچ. (ئەردە.، هەورا.) رایەڵی بن میچ، بالار. مەردومی درێژ و زەلام.

**تەژەنەر:** چتێکی درێژە. مەردومی درێژ و زەلام.

**تەژک:** تەشکەبەرە، تابیژ، تەختەبەرە، تەشک، لاتەختەبەڕ. پێستی نێوگەڵی ئاژاڵ و وولاخانە. تەژە. هەژگ، جوورە کاڵایەکە، کە لە کەتان دروستکرابێ.

**تەژنە** (هەورا.): تینوو، تینگ.

**تەژنیی** (هەورا.): تێنوویتی.

**تەژی** (باک.): (باک.) تەژ. پڕ. ــ کرن: پڕکردن. تێر. تۆش، ئەتۆش.

**تەس:** ووشەیەکە بۆ لێخوڕینی گاجووتی بارەبەر بەکاردێنرێ. تەبەک، تەسە. (ڕەوا.) پاشەوپاش. ــ کردنەوە: پاشەوپاش گەڕانەوەی وولاخان. کشانەوەی وولاخان. ووشەیەکە بزنی پێ لێدەخوڕن. هەربەو ووشەیە ئەسپ و ماین و ئێستریشی پێ لێدەخوڕێ. (هەورا.) تەبەکی دارینە، نانێن، تەسە.

**تەسەزاڵ** (هەورا.): ترسەنۆک. ــ ی: ترسەنۆکی.

**تەسەل:** تێر، تێروپڕ، واژی (برسی)یە. دڵنیا. ــ بوون: تێربوون. ــ کردن: تێرکردن. ــ ی: تێروپڕی. دڵنیایی.

**تەستەزینگ** (باک.): دارێکە. (باد.) ماسی گرە.

**تەسک:** واژی پان، تیوار، کەم بەر.

**تەسکایی:** تەسکی، تیواری. تیوێتی.

**تەسکوترووسک:** چتی زۆر تەسک.

**تەسکی:** تەسکایی، تیواری، تیوی.

**تەسمە:** هەڵەنگووتن.

**تەسوو** (ئەردە.): سیرمە.

**تەسی** (باک.): ئیشکی، ووشکی (بۆ نان).

**تەشاوی** (ئەردە.): کلاوڕۆژنە، کولانەی سەربان یا دیوار، ڕۆچنە.

**تەشە** (ئەردە.): (ئەردە.) تەشاوی. کلاوڕۆژنە، ڕۆچنە، کولانەی سەربان یا دیوار.

**تەشەر:** تەشە، تەووس، لاتاو، پلار، پەلار، تووانج، تانووت، ــ لێدان: تووانج لێدان.

**تەشەنە:** ئاوەدز، تاوگاز، ئاوساو (برین). پێوەچوون، بەلاڤبوون، تەشەنا. وەبندانەوەی برینانە.

**تەشەنەدار:** برینێکە ئاوەدزبووبێ. ــ ی: ئاوەدزی.

**تەشەنەک** (ئەردە.): تەشەنە، پەنام، هەواکێشان.

**تەشەنەکردن:** تەنینەوەی برین و خۆ خوواردنەوە.

**تەشبی** (ئەردە.): تەبەقە ترانە.

**تەشبی ترانە** (ئەردە.): تەبەقە ترانە.

**تەشپی:** (فە.) تەبەکی دارینەی هەویر و نانی. (هەورا.، ڕۆژ.) کۆشک، قاپی دارینەی چێشتی هەندێکیان وەکوو دەوری پەلە.

**تەشپی ترێن:** بریتییە لە مەردومی زۆر خۆر.

**تەشپیلۆکە:** تەشپی گچکە.

**تەشت:** سووڕێنەی مەسینە. (زاخ.) گەرکە، دەست. تەسە، تەس.

**تەشتەلۆکە:** تەشتی گچکە.

**تەشتۆک:** تەشتی گچکە. حەوش یا سەربانی ڕاست و کەمێک لێژ.

**تەشتۆلکە:** تەشتوولکە.

**تەشتوولکە:** تەشتی گچکە.

**تەشتێ** (ئێرە.): نانی بەیانی، بەرچا.

**تەشتی خەمیری** (فە.): تەبەکی هەویری.

**تەشتیر** (زا.): گیسکە مێ.

**تەشخەڵە** (ئەردە.): تەشقەڵە.

**تەشق:** تووا، تەووڕژم، تەشک. (دەر.، هەورا.) پشکۆ، پشکووێ. (هەر.) پۆل، پۆلی. ــ ی هەوا: پۆلی هەوا لە (٢٠) شوبات دەشکێ. ــ ئاو: پۆلی ئاو لە ٢٧ شوبات دەشکێ. ــ زەوی: پۆلی زەوی لە ٦ ئازارێ دەشکێ. ــ ی دەشکێ: پۆلی دەکوێ. ــ ی ساردی: تەووڕژمی ساردی. بەو بارانە ــ ی ساردی شکا.

**تەشقەڵە:** فێڵ،فرلداغ، گەڕ، گێچەڵ، فێڵ و فەرەج، تەڵەکە، چەف، تیتار، تەون و بەست، گریشە، شەڵتاخ، بەڵا، چەپۆکی ڕۆژگار، بەرهەڵست. ـــ کردن: گەڕکردن بە مەردووم، گرەکردنی نارەوا بۆ داگیرکردنی چتێک.

**تەشقەڵەباز:** فێڵباز، فرلداغچی، تەڵەباز، هەڤانچی، گەڕکەر. ـــ ی: فێڵبازی، فرلداغچێتی، تەڵەبازی، هەڤانی.

**تەشقەمە** (هەورا.): وورگی حەیوان.

**تەشق شکان:** تەووژمی ساردی شکان.

**تەشک:** (هەورا.) تەرک کەوتنی وولاغ. (زا.) لاق. تەنیشت. (شن.) داوێن، شاقەل، ئاتەگ. قەوارە، قەلاڤەت، قڵغ.

**تەشکە:** لباد،بەرە یا مافوورەیە، کە هەر بە گچکەیی دروستکرابێ.

**تەشکەبەرە:** پارچە بەرەیێکی تەسک و گچکەیە. (دەر.) تەشکەوەرە. (باد.) تاییژ. (باک.) تەژک، تێژ. ووتەیەکیشە نووسراوی دووروودرێژی پێ وێ دەچووێنرێ کاتێکی، کە لەسەر قاقەزی گەورە نووسرابێ، فیسارەکەس ـــ یەکی نووسیوە.

**تەشکەڵ** (کۆ.): داوێن.

**تەشک زراڤ** (باک.): لاواز، بێ تین.

**تەشک زراڤی** (باک.): لاوازی، بێ تینی.

**تەشک کەوتن:** بێ تین کەوتن، لا کەوتن.

**تەشگاه** (لو.): مەقەڵێ.

**تەشوو:** تەشووێ.

**تەشووێ:** (هەو.) تەپشوو. تەوشوو. تەوشی. (ڕەوا.) تەمشوو. (دەر.) تیشی. (باک.) تەفشوو، تەڤشۆ. (هەورا.) ترشە، ترێشتە. تێشە، تەوشێ.

**تەشی:** دوویک. (کە.) دووک. (هەورا.) لەتەرێ، لەتەرە. (ڕۆژ.) چریغ. مرازێکی کلک درێژ و سەلک خڕی قولابەدارە خوری و لۆکەی بە دەست پێ دەڕێسرێ. سەلکەتەشی: (هەورا.) سەرلەتەرێ. کلکەتەشی: دیفک.

**تەشی بریق** (فە.): برووسکە.

**تەشی ڕستن:** ڕستنی موو و خوری و لۆکە بە تەشی. پێچکەپێچکەکردن بۆ یەکێکی.

**تەشی ڕێس:** کەسێکە تەشی بڕێسی. چیایەکە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەلاتی ڕەواندزێ. ـــ ی: پیشەو و کرداری تەشی ڕستن، تەشی ڕستن.

**تەشیکە:** جوورە مێشێکی کەمێک گەورەیە وەکوللەی دەچێ.

**تەشیلان** (لو.): هەڵماتێن.

**تەشیلە:** لۆکە یا خورییەکە، کە بە خەرەک ڕێسرابێ و لە دووخدا مالرابێ. خولخولۆکەیەکی دارینەیە ماشەری پێدا دەکرێ و لەسەری دەکرێ بە گولۆڵە. هەڵمات.

**تەشیۆک** (باک.): جوورە هەڵپەڕینێکی کوردییە.

**تەشی هەڵکەر:** دوو دارە هەریەکەی کونێکی تێدایە ئەمسەرەوسەری تەشی پێدا دەکرێ و ڕێسراوی لەسەر هەڵدەکرێ.

**تەعەد** (زا.): جوورە گێوژێکە.

**تەعل** (زا.): تەحل.

**تەغار:** (موک.) کێشێکە بۆ دەغڵ و دان، تەغار چوار پووتە، لە ئەردەلانێدا ٣ مەنە گۆیا سی ڕبە لە گەنم و جۆ و برنجێکە. سی دانەیە لە هەندێ چت. سی گورگە تەغارێکە.

**تەغارو:** دەفرێکی پینەچیانە، کە پینە و چەرم و پێلاوی کۆنی تێدەنێ تا بخووسێن.

**تەغمن:** (ڕەوا.) تەخمن، تەرخ.

**تەغمە** (ڕۆژ.): داغمە، ئەو دروشمەیە، کە بە ئاژالانییەوە دەنێن تا بزر نەبێ زۆر جاران وەکوو مۆر نێوی خاوەندیشی تێدایە.

**تەف:** بەه، بەهبەه، هەیهەی. دیوێکە لەمیچ (بۆ پەسنکردن و ئافەرینە). (موک.) لا لووسەکەی جگییە. (کۆ.) پشتە. تەفە(تەففە). (باک.) بەتەواوی، تێکڕا، گشت.

**تەفاری** (زا.): جوورە هەنجیرێکی نایابە.

**تەفاریک** (باک.): کرێگرتە، کرێچی. کەسێکە خانووی نەبێ لەو ئاوایییەیدا، کە تێیدا دانیشتووە، یا زەوی و زاری نەبێ و سا خەڵکی وێ بێ یا ئاوارەبێ.

**تەفە** (تەففە): لا لووسەکەی جگییە. (کۆ.) پشتە.

**تەفت** (ئەردە.): سەوەتە، قەرتاڵەی میوە.

تەفت

**تەفتی** (باک.): گەغی کوتراوە. گەغی شکاو. چێشتێکە لە گۆشت و گەغەکوتاو دروست دەکرێ.

**تەفتییک** (زا.): کورک.

**تەفر:** توونا، تەفروتوونا، نەبوو، بزر.

**تەفرە:** دەستخەڕۆ، دەسخەڕۆ، (باک.) چاغ و بەنگ. خشتە، فێڵ، تاو، گوڵ، فریو، خاپ، لە خشتە، تەرفە، جامبازی، ئەمڕۆ و سبەی، دەسی دەسی، دەستی دەستی، ئیمڕۆژ و سۆزی.

**تەفرەباز:** تەفرەدەر، دەرگوشم، فریودەر. ـــ ی: تەفرەدان، فریودان.

**تەفرەخوواردن:** تەفرەدران، خەڵەتان، فریودران.

**تەفرەدان:** خەڵەتاندن، فریودان، دەستبڕین، دەست بەزاخا کردن، (باک.) خاپاندن، دەستخەڕۆکردن، لە خشتەبردن، تەرفەدان. (جا.، بابا.) لاسدان. دەست بڕین، تەپ پێ کردن،چارخ و بەنگ کردن، خاپاندن، فێڵ لێکردن، قۆڵ شکاندن، خچاندن، هەڵخەڵەتاندن، دەست لەبنەوە بڕین.

**تەفرەدەر:** فێڵباز، فێڵزان، فریوباز، فریودەر، (باک.) خاپۆ، خاپۆک، خاپینۆک. قۆڵ شکێن، لە خشتەبەر، خەڵەتێن، خەپۆ، هەڵخەڵەتێن، زەوتەک. دەرگوشم. زانەخڕۆ، زیانی خڕۆ.

**تەفرەدراو:** تەفرەخوواردوو، خەڵەتاو، فریودراو.

**تەفروتووونا:** تەفر، نەبوو، تەرتەوەرتە، ئاوارە، دەربەدەر، لەناو چوو، بەرباد، تەرە، توونا. ـــ بوون: لەناوچوون، دووابڕان. قڕبوون، قڕان تێکەوتن.

**تەفروتووناکردن:** تەرتەوەرتەکردن، دووابڕینەوە، قڕان تێخستن، بەربادکردن، داغانکردن، توونا کردن، دەربەدەرکردن.

**تەفشۆ** (زا.): تەشووێ.

**تەفشوو** (باک.): تەشووێ.

**تەڤ** (باک.): هەموو، گشت، تێکرا، لە هەڤ، تەڤدە، پێکەوە. لەگەڵ.
ـ مەهەڤ: ئاڵۆز و ناڕێک. کۆما.

**تەڤا**(باک.): تەبا. هەمووان، گشتیان.

**تەڤایی** (باک.): تەبایی.

**تەڤە** (باک.): تەپ و مژ.

**تەڤەر** (باک.): تەوور، تەوەر، تەوەرزین.

**تەڤەنی** (هەورا.): بەرد.

**تەڤتەڤیک** (زا.): کەمانچە.

**تەڤجڤان** (باک.): بەندیواری، پەیوەندی، نزیکی.

**تەڤدا** (باک.): زیانی خرۆ، زیاندەر، زیانگەیێن.

**تەڤدان**: تێکوەردانی چێشت لەسەر ئاووری.

**تەڤدایی** (باک.): زیانی خەرزیی، زیاندان، زیانگەیاندن.

**تەڤدە** (باک.): هەموو، هەمی، تێکرا، گشت.

**تەڤدیر** (باک.): تەگبیر.

**تەڤر** (باک.): قوڵینگ، تەوور، بیووری دووسەر. ـ دان: قوڵینگ لێدان.

**تەڤرزین** (باک.): تەوەرزین.

**تەڤز**: شۆخیێ،قەشمەری، تەووس، گاڵتە پێکردن. ـ پێکردن: قەشمەری پێکردن.

**تەڤزاندن** (باک.): قایم کردن، داپۆشین بە گڵ. تەزاندن، کوژتن. ساردکردنی ئاو و چتی تر.

**تەڤزک** (باک.): قرچ هەڵاتن بۆ چەرم و ئیتر. جوورە هەنجیرێکە.

**تەڤزی** (باک.): تەزوو، خورین بۆ ماوەیەکی لە یەک یا لە چەند ئەندامێکی لەش ناگەڕێ دووایە پێیدا دەگەڕێتەوە.

**تەڤزین** (باک.): قایم بوون، داپۆشران، تەزین، تەزوو پێداهاتن. خۆفڕێدان. خۆکشاندن. تووشی نەخۆشی و دەرهاتن.

**تەڤش** (باک.) لاک. ساپ، بەردێکی پانە منداڵان ساپێنی پێ دەکەن.

**تەڤشۆ** (باک.): تەشووێ.

**تەڤگەر** (باک.): جێگا، شێوەی ڕۆیشتن.

**تەڤل** (باک.): تێکەڵ. ـ کرن: تێکەڵکردن.

**تەڤلدم** (باک.): تێکەڵ و پێکەڵ.

**تەڤلیهەڤ** (زا.): چەندچتێکن، کە دانرابن بۆ ئەوەی، کە ئامێتە بکرێن.

**تەڤن** (باک.): تەوون.

**تەڤنپرک** (باک.): تەونی جاڵجاڵۆوکە.

**تەڤن پیرک** (باک.): تەونی جاڵجاڵۆوکەیە. جاڵجاڵۆوکە.

**تەڤنک** (باک.): کاری گچکەی تەونی. تەونی جاڵجاڵۆوکە. ـ ا پیرێ: تەونی جاڵجاڵۆوکە.

**تەڤنی پیرپیرۆشک** (باد.): تەونی جاڵجاڵۆوکە.

**تەڤوو** (باک.): بەڵکوو.

**تەڤینگ** (باک.): لووتکەی چیایان، تۆقەسەری کێوان.

**تەق**: (باک.) تەقە، دەنگی چتێکی ڕەق وەچتێکی ڕەقی تر بکەوێ یا دەنگی چەکان. (باک.) تەرق، شەق، پارچە، ـ بوون: شەقبوون. ـ بردن: شەقبردن. (خۆ.) لەکاتی باوەڕنەکردنێدا دەڵێن.

تەڤنی پیرپیرۆشک

**تەقا**: (خۆ.) دەق، دەقاو دەق، کوت، کوت وەمت، کوتولت. هەڤری. (باک.) پایەدار، خۆپەرست. بارام تاقەیە: بەپایەیە.

**تەقالا** (ئەردە.): تەقەلا.

**تەقالک** (زا): وولاڵە.

**تەقان** (باک.): چراف، زنەک، تەقین، ترەقان.

**تەقاندن**: (باک.) پەقاندن. ترەقاندن، ئاووردانی چەک. ئاگردان. ـ ی چەک: تەقەکردن، ئاووردان. ـ ی مل و قۆڵنج و قامک: قۆڵنج شکاندن. ڕاونان، ڕەتاندن، تەقەتێخستن.

**تەقاندنەوە**: لە بێژنگ و قەلبیردانی دانەوێڵە بۆ گرتنی ووردەکەی.

**تەقانن**: تەقاندن، ئاووردان. تەقاندنەوەی دانەوێڵە. چەسپاندنی چتێک بە چتێکەوە، پێوەنووساندن. (ئەردە.) لێدان. هەڵێنانی هێلکە لەلایەن مریشکە کورکەوە. (ئەردە.) تەقاندن، ئاگردان (چەک). قرتەلێ هێنانی گرێی قامکان، لێدان. (ئەردە.) دابێژتن، لە بێژنگدان، بێژانن. پشکنین، گەڕان.

**تەقاننەوە**: تەقاندنەوە.

**تەقاو**: تەقیار، پەقاو، پەقیاو، تەقیو.

**تەقاویت**: کەسێکە ماوەی فەرمانبەرێتی میری تەواو بووبێ.

**تەقە**: (باک.) ڕەقە، شەماتە، پاب، پاپ، پێژن، تەرەقە. شریقە، شرقە، شەرقین. دەنگێکە لە وێک کەوتنی دوو چتی ڕەق ڕوودەدا یا هی چەکان. ـ کردن: تەقاندن، پەقاندن، تفەنگ ئاویژتن. ـ تێکەوتن: ڕەوین، شکان، هەڵاتن. ـ لێ هەستان. ـ تێکەوتن.

**تەقەتقووک** (زا.): چەقەنەی ئاشی.

**تەقەتەق**: ڕنگەڕنگ، دیووڵ، (باک.) ڕقرتۆک. پەقپەق، چەرقین. تەق و هۆڕی یەک لە دووای یەکتری. ـ ی چەکان: قرمەقرم. ـ کردن: چەرقین.

**تەقەتێکەوتن**: هەڵاتنی دانیشتووان و چۆڵ بوونی شووێنێک: دەڵێن بازاڕ تەقەی تێکەوت: واتە هەموو کەس هەڵاتن و چۆڵ بوو. نەمان و بڕانی شیر لە مەمک یان لە گووانی ئاژاڵ و ماڵاتان: مانگاکە تەقەی تێکەوت : واتە شیری نەما.

**تەقەداکەوتن**: پەیدابوونی تەقە لە چەند لایەکەوە. قسەی ڕەقە، کە لە نێوانی چەند کەسێکیدا ڕوودەدات.

**تەقەزە** (با.): بۆ جەخت ( تەئکید بەکاردەبرێ). دەبێ: دەبێ بێی، دەبێ بەجێ بێ.

**تەقەس** (باد.): بەڕاستی، وەکات.

**تەقەفیرە** (ئەردە.): فێراندن،زگچوون.

**تەقەکەر**: تفەنگ ئاوێژ. چەک ئاووردەر.

**تەقەکردن**: چەک ئاووردان. قەڵشین، ترەکین.

**تەقەڵ**: جارە دروونێک، دەنکە دروومانێک، دانەی دروومان. ـ لێدان: تاکتاکەدروون.

**تەقەلا:** تەلاش، خەبات، کۆشش، پەلەقاژە، هەڵپە، هەوڵ، کۆشەوە، پەلەکوتێ، پەل وەشانن.

**تەقەلاخ** (ڕۆژ.): پارچە چەرمێکی کوندە یا مەشکەی پێ پینە دەکرێ. پارچە کوولەکەیەکە، کە چاوەشان دەیخەنەسەر زوڕنا.

**تەقەلادان:** هەوڵدان، خەباتکردن، تێکۆشین، خەبتین، کۆشین، خەفتیان، خەفتان، خەفتین.

**تەقەلادەر:** هەوڵدەر، تێکۆشەر، خەفتیار.

**تەقەڵبەربوون:** دروومان هەڵوەشان.

**تەقەڵبەست** (ئەردە.): کۆکی دروومان. سەردروو.

**تەقەڵتێهەڵدان:** دروومانی بە دەرزی و تەقەڵ لێدان.

**تەقەمەنی:** ئەو چتمەک و کەرەستە و مرازانەن، کە دەتەقێنرێن وەکوو فیشەک، بۆمباو ئیتر.

**تەقەمەنی سەخت:** ئامرازێکە سەخت بتەقێ پارچەکانی زۆر بلاوبێتەوە.

تەقەمەنی

**تەقەوڕەقە:** تەق و تۆق، تەقوڕەق، هەست و خوست.

**تەقەی دیان** (ئەردە.): قرچەقرچی ددان.

**تەقبردن:** شەقبردن.

**تەقتاق:** (هەورا.) تەقتەقۆ. فیچقەی ئاوێیە لە قامیشی دروستدەکرێ وەکوو قۆچەقانیش بەردی پێداوێن. (باک.) دارێکی کونکراوە مندالاَن بەردی پێ دەهاوێژن.

**تەقتەق** (باک.): تەقەتەق، دەستڕێژی چەکان. شەوی دەیەمینی مانگی بەهمەن.

**تەقتەقان** (جا.، شار.): پلیکانی بەردی گەورەو پانە لەجێگایانی خۆڕسکدا.

**تەقتەقۆ:** بڕوانە: تەقتاق.

**تەقتەقۆک** (باک.): تۆقتۆقەی مندالاَنە. چەقچەقۆک، گیایەکە درووی وەهی گوێنی دەچێ، چەند گوڵێکی سوور و سپی فوودراو دەردەکات مندالاَن لە نێوچاوانی خۆیانی دەدەن تابتەقێ. (دەر.) تیوڵتەقێنە.

**تەقتەقووک:** بڕوانە: تەقتەقۆک.

**تەقتەقیلە** (هەورا.): قەپقاپ، قرپەقرپ، کەوشەدارینە.

**تەقتەقیلەساز:** قاپقاپساز. ـــ ی: قاپقاپسازی.

**تەقتووق:** تەقاتۆق، تەقووتۆق، تەقەوڕەقە، دەنگی وێک کەوتنی چەند چتێکی ڕەقە و قرمە قرمی چەکانە.

**تەقرەق** (باک.): تەقەوڕەقە.

**تەقرەقووچ** (هەو.): تەقڵە.

**تەقرەقووچباز:** تەقڵەباز.

**تەقرەقووچبازی:** تەقڵەبازی.

**تەقکردن:** لێدان لە زاراوەی مندالَی ساوایە، کە پێی بڵێی لێی دە: دەڵێی تەقی کە. شەقکردن، شەق بردن، لەبەر زۆر گریان و ماندووبوونی مندالَی ساوا.

**تەقل** (باد.): تەکان، بال، وەشە، پاڵەپەستۆ. فەرهاد بارامی دا بەر تەقلا: پاڵنان، تەکاندان.

**تەقلە:** کلاَو، تەقیلە، تەقیە. یەکەمین بەری هەنجیرییە، کە بەناکامی هەڵیدەوەرێنێ.

**تەقڵە:** سەرمەقولات. بە ـــ ڕۆیشت: یەکرکێف و ڕاستەخۆ ڕۆیشت و غاری دا. گەمەیەکی کوڕانە. خۆ هەڵگێڕانەوە بەسەریدا. کەڵبە هەنجیری نەگەیشتوو. (ئەردە.) جریت، جلیت.

**تەقڵەباز:** تەقرەقووچباز، بە مرۆ، باڵندە، یا فڕۆکەییێکی دەڵێن، کە ـــ بێ. ساختەچی، فێڵباز. کۆتری ـــ: کۆترێکە لە حەوادا تەقڵە باش لێبدات، بۆ کەسێکی واش بەکاردەبرێ. ـــ ی: تەقرەقووچبازی. گەمەیەکە.

**تەقڵەکردن:** تەقڵەلێدان.

**تەقڵەلێدان:** تەقڵەکردن، لەسەر زەوی یا لە هەوادا سەرمەقولات لێدانی مرۆ و باڵندە و فڕۆکان. بەسەردەستاندا، تەقرەقۆچ.

**تەقن** (باک.): قوڕی زۆر، قوڕ. (باک.) هەند، بڕ، نەخت، تەقنەک چووم: هێندێک چووم.

**تەقناندن** (باک.): لە خیزیدا ڕۆچوواندن.

**تەقنین** (باک.): لە خیزیدا ڕۆچوون.

**تەقوو:** بەڵکوو، نەکوو، نەبادا، مەبادا، نەوەکوو. ووتەیەکە ترس نیشاندەدا وەکوو دەڵێن: بۆچی بەو شەوە بڕۆم ـــ ڕووتیان کردن، ـــ ڕووتم کەن.

**تەقوپۆق** (ئەردە.): تەق و تۆق (چەکان).

**تەق و تەف:** چەق و تەف.

**تەق و تەفێکە:** چەق و تەف.

**تەق و تل** (ئەردە.): بەهەر تیرێکی لە نێچیرێکی دان.

**تەق و تۆق:** تاق و تۆق. تەقە و ڕەقە، هەست و خوست. چەند دەنگێکی بەرز و نزمن لەچەند لایەکەوە.

**تەق و دەو** (ئەردە.): تەق و ڕەو.

**تەق و ڕەو:** هەلاَت هەلاَت لە ترسان. تێکچوونی ئاسایش.

**تەق و هۆڕ:** تەقەتەق و هەراوهۆریا.

**تەقی:** چەکەکەتەقی. ـــ ئاووردرا. یەکێکی نەدیو هەلاَت و ڕەوی.

**تەقیاگ:** تەقیو، تەقێنراو. دانەوێڵەیەکە تەقێنرابێتەوە و دابێژرابێ.

**تەقیاو:** تەقاو.

**تەقیلە** (جا.، هەورا.): کلاَو، ئارەقچن، تەقلە.

**تەقیلە لەسەر تەقیلە:** جوورە گەمەیەکە، کە چەند کەسێک بەخڕی دادەنیشن، وەستاکەیان لەوکاتەدا دەڵێ: تەقیلە لەسەر تەقیلە هەر کەس نەیبێ زەلیلە، پشکۆ لە سەرسەبیلە.

**تەقیلین** (زا.): هەڵخلیسکان.

**تەقین:** پەیدابوونی ئاوی زۆر لە کانی و کارێزاندا لەکاتی بەهاراندا. دەنگی ترازانی جومگەی گیاندار. دەنگی قۆڵنج شکاندن. تەقان، ترەکین. تۆقیینی چەکان، ئاووردانی دەمانچە، تفەنگ و تۆپ و ئیتر، گرێن، دەرچوونی چەک. ڕەوین، هەلاَتن، تەورین، کەوتنە تەلاسکە، ئاوابوون، تێتەقاندن، (ئەردە.) ڕووخان، ڕۆچوون. تەقبردن، شەق بردن، لە قوڕچەقین. درزبردنی پیاڵە و بۆڕی و چتی تر لە گەرمان یا لە سەرما.

تەق بردن و پارچە بوونی بەروو و هێلکە و هی تر لە نێو ئاوریدا بەچەشنێکی وا، کە دەنگی لێ بێ.

**تەقێن:** تەقەکەر، تفەنگ ئاوێژ.

**تەقیو:** تۆقیو، چەکی ـــ : چەکی ئاووردراو. هەڵاتوو.

**تەقینەوە:** تەقینی گوللە لەو کاتەدا، کە وەچت بکەوێ. بڵاوبوونەوەی دەنگ و باسی زۆر بە خێرایی. چەوسانەوە و هەوڵدان. هەوڵدان: هەرچەندە شەو و ڕۆژ دەتەقێمەوە پێبژیوی خۆم پەیدا ناکەم.

**تەک:** (ئەردە.) نانەشان، قەرتاڵە، تریان. یەک، پەککوو، تەککوو. لە کاتی سەرسوورمان و واق وورمانێدا بەکاردەبرێ. تەنها، تەنیا، تاک. (ئەردە.) بنەهەنگڵ. بنی چتی قوول. تەپکە. (ڕۆژ.) پەرە، لێکەوتنەوە. وەپێشکەوتن. (جا.) کن، لا، گەڵ، تەنیشت، گەر. لە ـــ : لە تەنیشت، لەگەڵ، لەگەر. (باک.) دەمانچە، وەروەر.

**تەکات** (ڕۆژ.): ئەوبەندییەیە، کە لە بەندیخانەدا زنجیری لەپێ نەکرێت.

**تەکان:** (موک.) داتەکان، داوەشان. تەووژم. شەق: دایە بەر ـــ : وەبەر شەقیدا. هێرش، پەلامار، (باک.) بەراد. چندک. هوژم، جووڵە.

**تەکانەوە** (کرما.): خۆلێ دوورخستنەوە، وازلێهێنان، بەجێ هێشتن، تەکینەوە.

**تەکانخوواردن:** جووڵانی چت لە جێی خۆی بە هۆی تەووژمێکەوە، داخورپان، داخورپیان، داچڵەکان، داچڵەکیان.

**تەکاندان:** هەژاندن، چندکدان، پاڵپێوەنان.

**تەکاندنەخۆ:** خۆ بزاوتن، چندکانخوەدان، زلق دانەخۆ، خۆکوتان بە تەووژم.

**تەکاندن:** شەکاندن، شەکانن، تەکان لێدان. ڤەشین، وەشین، (هەورا.) تەکتای، وەشاندن، داوەشاندن، داتەکاندن، ڤەخوماندن، داکوتان، ڕاوەشاندن، هەژاندن. گجگجاندن، هلپڤاندن، ڤەوەژارتن، ڤەوەشاندن، تۆز لێکردنەوە. ـــ ی دار: بەر وەراندن، ڕاچاندن. ـــ ی کەل و پەلی پیس و تۆزاوی: داتەکاندن، داوەشاندن. بتەکێنە.

**تەکانن:** تەکاندن.

**تەکاو:** داتەکاو.

**تەکە:** (ئەردە.) پاڵ پێکەوەدانی چەند کەسێکییە بۆ جێ کردنەوەی یەکێکی تر. هاتوچۆ، ئەملاولا، جووڵە. (موک.) خاڵێکە لە پەڕی قوماری پەڕانتوویدایە.

**تەکەتەک:** بەلەبەل و هات و چۆی چتی شۆڕە. شەکەشەک.

**تەکەتەکە:** جووڵە جووڵ، شەکەشەک.

**تەکەدان:** پاڵدان.

**تەکەدانەدوواوە:** کشانەوە، پاشەوپاش گەڕانەوە.

**تەکەربوون** (دزە.): تەکەربوونەوە، بەربوونەوە خوواری، کەوتن، (ڕەوا.) کووربوونەوە. (دەر.) وەردەوەبوین. ـــ کردنەوە: بەردانەوە، کوورکردنەوە.

**تەکەکردن:** پاڵدان.

**تەک کەفتگ** (ئەردە.): ترگە، هاوڕێ، هامڕا.

**تەکەکردن:** هاتووچۆ و جووڵانەوەی چتی شۆڕە.

**تەک کەفتن** (ئەردە.): هاوڕێ بوون، لەگەڵ ڕۆیشتن. پەک کەوتن.

**تەکەڵتوو:** نەرمەمزین، ئەمدزین، ئارەقگیر. ئەو قایشەی زینییە، کە دەکەوێتە ژێر ڕانانەوە. چەند قەدە لبادێکیشە دەکەوێتە ژێر قەڵتاغی زین.

**تەکەنە:** لبادێکی گچکەی یەک کەسییە.

**تەکەی قەلی** (موک.): تاکە خاڵێکە لە کارتی قوماری پەڕانتوویدا.

**تەکبەر** (باک.): نێوماڵ، ناوماڵ.

**تەکبەند:** پشتێندێکە بە ئاوریشمی چنرابێ. تەگبەند، کەمەر، هەمیان، تەگبەن، پشتێند.

**تەکبیش** (موک.): بژاری نێو ڕەزانە.

**تەکدان:** چوونە پێشەوە بە نهێم. فیسارەکەس (تەکی داوە بە پێشەوە). تەکەدان.

**تەکدانەدوواوە** (ئەردە.): چوونە دوواوە.

**تەک کەفتیاگ:** پەک کەوتوو.

**تەک کەوتە:** تەککەوتوو.

**تەک کەوتوو:** کەسێکە، کە دووای یەکێکی کەوتبێ.

**تەکمە:** جووەرە لبادەیێکی ئاوداری پڕ تەرییە تا سەر ئەژنۆیان لە سەرکالاوە دەپۆشرێ: نیم تەنە، سەڵتە، تاقمە.

**تەکنای** (هەورا.): تەکاندنی کەل و پەلی تۆزاوی.

**تەکوو** (تەککوو): پەککوو. لەکاتی سەرسوورمانێدا بەکاردەبرێت.

**تەک و جەم** (فە.): جووڵە، تەکان.

**تەک و دەو:** تەق و دەو.

**تەکووز** (باک.): تەواو، گشت، ئامادە. پێک: دبێژن: هی نیشێمە ـــ نەبوویە: هێشتا نیشی مە پێک نەهاتووە. تەکووزبوون: پێکهاتن، ئامادەبوون.

**تەکیە:** جێگەی دەروێشان. سەکۆی بەردەرگا، ئاستانە. دارەدەست.

**تەکیەدان** (ئەردە.): پاڵدانەوە، بەلاداکەوتن.

**تەکیەگا:** تەکیەی دەروێشان، ئاستانە. پشتیوان، پاڵوویەن، پشت.

**تەکیەی دەرگا:** ئاستانە، بەردەرگا.

**تەکێنەر:** هەڵتەکێنەر، داوەشێنەر، داتەکێنەر.

**تەکیمە:** لبادێکی ڕاییخی گچکەیە.

**تەکێنمە:** لباد و ڕاییخێکی گچکەیە.

**تەکینەوە:** (کە.) دووری کردن، دەست هەڵگرتنی یەکێک لە یەکێک یا لە کارێک و لێ دوورکەوتنەوەی کەمکەمە. بتەکەوە: دوورکەوەوە.

**تەگە:** هەروەکوو فاڵ بۆ مایین، کەڵ بۆ مانگا بەکاردەبرێت تەگەش بۆ ئاژاڵان بەکاردەبرێت. (کە.) بەتەگە: وەتەگە. بە ـــ بوون: هێچ بوون. وە ـــ هاتن: هاتنە بەران، هێچ کەتن. پتر بۆ بزن بەکاردەبرێ. نێری. ـــ خوواردن: . (هەو، کە، ئەردە.) نێری، تگە، سابرین، (ئەردە.) حەچە.

**تەگەر** (کۆ.): بەدروومان پێوەدانی سەری ئێمەنی و بنەکەی دەڵێن. تەگەرە.

**تەگەرە** (موک.): تەگەر، گرێ، بەهانە، پەڵپ، قۆرت، ڕووشە، کێشە، کلۆڵی، پەتەر، گێچەڵ، تێکدانی کاروبارێک و دوواخستنی. تەفرە،

دەستی دەستی. پێچک، تایەی عەرەبانە و ئوتۆمبیل. دار یا ئاسنێکە دەخرێتە نێوەڕاستی بەرداشی خوارەوە. تەوەرە، کەوەرە. (ئەردە.) دارێکە لە نێوانی بەردی ئاشی دەکوتن.

**تەگەرە تێخستن:** تێکدانی کار و دوواخستنی.

**تەگەرە تێکەوتن:** تێکچوونی کار و دوواکەوتنی.

**تەگەرەدان:** تەگەرەلێدان.

**تەگەرەلێدان:** تەگەرەتێخستن.

**تەگەرک** (هەورا.): تەرزە.

**تەگبەن** (ڕۆژ.): تەگبەند.

**تەگبەند:** هەمیانێکە بە ئاوریشم دەچنرێ، تەگبەن، پشتێندێکە لە ئاوریشمی دروست دەکرێ پێی دەڵێن هەمیان.

**تەگبیر:** نەوت، تەکبیر، تانگ، تەقدیر، ڕاوێژ، لەتەک یەکتریدا بیرکردنەوە، تەوم. ــ کردن: نەوتکردن.

**تەگر:** (ڕۆژ.) تەرزە.

**تەگرک** (لو.): تەرزە.

**تەل:** (باک.) لا، ڕەخ، ئال، تەنیشت. (هەورا.) تێل، تێلی ئاسن، کە باریک و درێژە بۆ دوورەژنەو و کارەبا و ئیتر بەکاردەبرێ، سیم. (باد.). تەلگراف، (باد) تۆل، زگ. کە باسی زگپڕی ئافرەتان بکرێت لە باتی زگ تەل و لە موکریانێدا (تۆل)ی بەکار دەبەن.

**تەڵ:** (بابا.، ڕۆژ.) تاڵ، هەودا، داو. (بابا.، ڕۆژ.) دان، دەنکە دەغڵێک. (ئەردە.) چڵ: ــ یێک دار، چڵێک دار، چڵی گیا، لکی دار. (ئەردە.) بژاردە، دانسقە، هەڵبژاردە. (ئەردە.) تاک، بێتا، بێ هاوتا. (ئەردە.) شاهەڵبەست، هۆنراوە (بەهێن چامە).

**تەلا:** زێڕی سپی. (فە.) زێڕ، زەڕ. ــ کار: زێڕینگەر. ـــ ی: زێڕینگەری. ــ کفت: زێڕکێش.

**تەڵان** (ڕۆژ.) باقەی دەخڵ و دانی درواوە. ئەو دەخڵەیە بە پووشەکەیەوە لەکاتی دروێنەدا دەکرێتە باقە.

**تەلار:** (هەورا.) تالار، کۆشک. (ئەردە.) هەیوانی سەرداپۆشراوی پێشی وە تاغان. باڵەخانە.

**تەلاسابوون:** دەرچوونی مرۆ لە ئەندازەی خۆی: فیسارە کەس تەلاسابووە.

**تەلاسکە** (ڕۆژ.) سڵبوون، سڵەمینەوە، تەقین، ڕەوین. لە دوورەوەکەوتە ــ : وەکوو ئاسکێکی لە ترسی نێچیرەوان ڕادەکات.

**تەڵاش:** هەوڕڵ، تەقەلا، کۆشەوە. (باک.) تەڵاش. کۆڵ، بەستەدار. (خۆ.) تەڕیش. (باک.) پێڕ. (شا.، هەورا.) تۆڵاش، گاز. (ئەردە.) تۆلاشە. (هەورا.) تەڕاش، تیغە. تەڵەزمی تەنک لە دار و چتی تر.

**تەڵاشەبەرد** (موک.): جوورە بەردێکە تەڵاشتەڵاش و تەنک لێک جووێ دەبێتەوە. تەمتەم، هارەینە، تەمۆخ.

**تەڵاشتن** (باک.): تاشین، تراشین.

**تەڵاشکردن:** تەقەلادان، هەوڵدان، تەلاشکردن.

**تەلاق** (دەر.): پاڵ. ــ دانەوە: پاڵدانەوە لەسەر تەنیشت یا ئانیشک و ئیتر.

**تەڵاق:** دەست لێکبەردانی ژن و مێرد، کۆتایی پێهێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی بەشێوەیەکی یاسایی و شەرعی.

**تەڵاقڕەش** (باک.): دووزمان، ئاوری ژێرکایە، ئاگری بنکایە.

**تەڵاقڕەشی:** دووزمانی.

**تەلاکار:** زێڕینگەر. ئاوەزێڕکار. ــ ی: زێڕینگەری. ئاوەزێڕکاری.

**تەلاکفت:** ئاوەزێڕ، تەڵاکاری.

**تەلان:** (موک.) بەندەن، بەرقەدی شاخان، گرد، تەپۆڵکە، تەپە، تەڵان، پلەی شاخ و کێو و هەردانە. هەورازێکە لەبەر بەرد و ناڕێکی پێداڕۆیشتنی سەخت و دژوار بێ. (زەن.، کەل.) ئازا، چوست، توندوتۆڵ. تەڕلان. ئەو پارچە بەردانەیە، کە لە چیایانەوە کەوتوونەتە داوێنی.

**تەڵان:** تەبارە.

**تەڵانە** (کرمان.): بنچینەی ماڵ، ئەو ناوماڵ و کەل و پەلەیە، کە دووای گوێزانەوەی بووکێ بەچەند ڕۆژێکی ماڵی باوکی بووکێ بۆ ماڵی زاوای دەنێرن یا دەبەن.

**تەڵانتەڵان:** تەلانتەلان: پلەپلەی شاخ و کێو و هەردان.

**تەڵانتڕە:** گیایەکی بەهاری قەفقەفە بەشوێنی تەلانەوە سەوز دەبێ.

**تەڵایی** (هەورا.): زێڕین، زێڕن.

**تەڵایی دەستەفشار:** لەوانەیە مەبەس لەو پارچە تەڵایەی خوسرەوی پەروێز بێ، کە لە کەل و پەلە سەیر و نرخدارەکانیەتی گۆیا پارچە زێڕێک بووە بە ئەندازەی دووسەد مسقاڵ بەناوی مشت ئەفشار واتا وەکوو مێوی نەرم بوو بەدەستی بە هەمووبارێکیدا دەگۆڕا لە پەڕتووکی ئێران لە سەردەمی ساسانیاندا یادگاری کریستن سن وەرگێڕاوی ڕەشید یاسمی لاپەڕە ٤٨٧.

**تەڵە:** (باک.) تالەە، خەفک، دەهفک. پێداڤ، پێکرۆک، لابک. (باد.) تەلی، سووت، سووتە. قووچ، تاڵە، داو، هەف. ئامرازێکە بۆ گرتنی مشک و ڕێوی و ئیتر دەنرێتەوە. بە ـــ وەکردن: پێوەکردن، تووشکردن، تووشی داو و گێچەڵێکی کردن.

**تەڵەب** (فە.): قوڕو لیمی ناو ئاو، فاڵ (بۆ وولاخی بەرزەیە). بە ـــ ە: بە فاڵە.

**تەڵەباو** (فە.): خڵتەی لافاو و قوڕاوێکی، کە نیشتبێ.

**تەڵەبەرد** (بابا.): ئاست، بەردی پان و درێژ.

**تەڵەپاکوتێ** (ڕۆژ.): پێ کوتان و پێ دانان بەبێ ئەوەی، کە باکی قوڕ و چاڵی بێ.

**تەڵەتەقێن:** مەبەس لە مەردومی فێڵبازە.

**تەڵەڕێوی:** (هەورا.) تەڵەوڕیوی جوورە تەڵەیێکە لە ئاسن دروستدەکرێ بۆ گرتنی ڕێوی و گورگ و داعبایان.

**تەڵەزگە:** هەڵخلیسکانێکە، کە لەلای پانییەوە هەڵبخلیسکێ. جێگای ئاستەم و سەخت. بقە، ترکزە، گێژەن، بەند، ڕووشە، تەگزە، ئێرەتی، تیرەکەڵەک.

**تەلەزم** (بابا): تیسماڵ، پارچەییێکی تەنکە، کە لە دار یا بەرد بێتەوە. تەڵاش.

**تەلەس** (جزیرێ): سەرخۆش، بەردەست.

**تەلەسەنگ** (ئەردە.): (ئەردە.) تەختەکوچک، تەختە بەرد.

**تەلەسم:** ئەفسوون، چاچۆل، جادوو، (باک.) باربەژن. مستی، هێندێک دەڵێن مارێکی ڕەشە لەسەر گەنجینەی نوستووە، هێندێکیش دەڵێن

نووسینێکە کەس نازانێ بیخوێنێتەوە. کلیلی رازانی نهێنی. نشتوو و هەر چتێکی بۆ چاووزار و پارێزگاری لە کێشەو رووشان هەڵباوەسرێ یا لە باسک کرێ. جوورە خشڵێکی ئافرەتانە.

**تەلەسم بەند:** ئەفسوون بەند، جادوو بەند. ـــ ی: ئەفسوون بەندی، جادووبەندی.

**تەلەسم ساز:** باریەژنگەر، جادووگەر، ئەفسوونگەر، چاچۆلگەر. ـــ ی: جادووگەری، چاچۆلگەری، ئەفسوونگەری، باریەژنگەری.

**تەلەسیسکە** (کۆ.): کەوانێکە لە داری چاڵووکێ لەسەر دار و گوویێ بان دادەنرێتەوە. بەفر، ڕەشانک.

تەلەفۆن

**تەلەفۆن:** دووردەنگ، دوورەژنەو.

**تەڵەکە:** گێچەڵ، فروفێڵ، تەشخەڵە، چاچووڵە، گەر، دەبە.

**تەڵەکەباز:** تەشقەڵەباز، بەگێچەڵ، بەتەشخەڵە. (باک.) هەڤان.

**تەڵەکەبازی:** تەشقەڵەبازی، بەگێچەڵی، گێچەڵ، فروفێڵ، (باک.) هەڤانی.

**تەڵەکی** (فە.): ڕزاو، (فە.) زەردەکی.

**تەڵەمسی:** ماشەی ماسیان، بقە.

**تەڵەمەشکێنە:** چۆلەمەشکێنە، چەڵەمەشکێنە.

**تەڵەمشک:** تەڵەی مشکی.

**تەڵەمڵە** (هەورا.): تەڵەی مشکی.

**تەڵەو** (ئەردە.): سۆراخ، لا، کن، چوومە ـــ ی: چوومە سۆراخی یا کنی.

**تەڵەو ڕێوی** (هەورا.): گورنەتەڵە، جوورە گەمەیەکە بە دووکەسان دەکرێ یەکێکیان بە تەڵەوە دەبێ و هەردووک دەست وپێی دەبەستن ئەوی دیکەشیان دەبێتە ڕێوی لاقێکی دەکەن بە ناوەندی هەردووک دەستی تەڵەکەوە، لاقەکەی تریشی دەخەنە ناوەندی هەر دووک قاچ و سەریشی دەخەنە ژێر زگی و پاڵێکی بە تەڵەیەوە دەنێن.

**تەلبەن:** تەلبەند.

**تەلبەند:** سنوور بە تێلی درواوی دامەزراو. پەرژینێکە بە تێلی درکاوی دروستکرابێ.

**تەلبەندی:** سنوور بەتێلی درواوی دامەزراندن.

**تەڵبژێن** (ئەردە.): هەڵبژاردن. هەڵبژاردە، دانستە.

**تەلبیش** (هەو.): بژاری بێستانانە بەو چەشنە گژوگیای لاوە گشت پاک دەکەنەوە و بنی برکەکانیش شی دەکەنەوە و خۆڵی تازە و کە پێویست بێ زبڵیشی تێدەکەن.

**تەلپا:** سپاردە، نەسپاردە، کرک.

**تەلخ:** خەیار و تەرۆزێکە، کە تازە بەدەم گوڵەوە سەرهەڵدەدەن، کە تۆزێ گەورەبوو پێی دەڵێن قیسکە.

**تەلخ** (باک.): تەڵخ.

**تەڵخ:** ڕەنگێکە شلوێ و لیڵ بێ وەکوو شووشەیێکی چڵکن و پیس و تاریک. ژیانی ـــ : زیندەگانی پڕ ئازار و چەرمەسەری. مۆن، ڕووگرژ.

**تەڵخەکردن:** تاقەتکردن.

**تەلدڕکدار:** تێلی دڕکاوی.

**تەڵزم** (ئەردە.): تەلیزم، تیسماڵک، چڵ، کە لە داری شکاو پەیدادەبێ.

**تەلدڕکین** (ئەردە.): تێلی دڕکاوی.

**تەلسز:** بێسیم.

**تەلفیز:** گاڵتە، تەلفیس.

**تەلفیس:** گاڵتە، تەلفیز.

**تەلق** (باک.): لیمان و کێم و هەوای دووای زانی کار و بەرخانە. پیسایی کار و بەرخی تازە زاوە لە پێش ئەوەدا، کە بیێتە پشکەڵ.

**تەلک** (باک.): ئارەقچن.

**تەل لێدان:** تێل لێدان، نامە بروسکە ناردن.

**تەلیت** (ئەردە.): کۆچ و بار، کۆچ و ماڵ.

**تەڵمیت:** کۆتەڵی شیوەن، وولاخی زینکراوە، کە جل و بەرگ و چەکی کابرای مردووی بەسەردا دەدەن بەشین و شەپۆڕ و شیوەنەوە بە ئاواییدا دەگێڕن. وولاخێکە بۆ سوواری ئاغاژن ئامادەکرابێ.

**تەلوار** (زا.): تەڕوال، تەڕەواڵە، تەڕواڵە. هەرزاڵ.

**تەلوپا** (ئەردە.): دەس و پا، پلوپا، هەووڵ، تەقەلا.

**تەلۆک** (کۆ.): خاڵگە، کەلەکە، تەراد. نەرمایی لاتەنیشت، گۆشتە نەرمەکەی سەر پەراسووانە.

**تەڵووک:** درووێکە وەکوو چاڵووک بەڵام بێ بەرە، (ئەردە.) دڕکەزی.

**تەڵۆک:** چەند تووڵێکی دارینە دەخرێتە ئەم سەروسەری چێغان بۆ قایمی.

**تەڵووکە:** (ئەردە.) تاڵووکە.

**تەڵووکی** (هەورا.): چاڵووک.

**تەلە** (باد.): تەڵە.

**تەلی** (باد.): تەڵە.

**تەلێر** (باک.): زگن، وورگن، زگ زل.

**تەڵێزم** (ئەردە.): تەلەزم، پارچە دارێکی وایە لە داری شکاو پەیدا دەبێ، تیسماڵک.

**تەلیس:** (هەو.) گونیە، گووش. گوشیلە، تێری یەکچاوە.

**تەلیسە** (ئەردە.): سووکە بارێکە لە وولاخ دەنرێ و لە سەریەوە سووارەدەبن یا بارێکی تری لەسەر دادەنێن. بنبار.

**تەلیک** (باک.): باوەش، ئامێز.

**تەم:** بووق، تەم و مژ، تەپ و لوول، (هەورا.) تەمە. مژ. هەڵمی ئاوو بوغی تەڕایی زەوی، کە لە زەوی و دۆڵ و نەواڵ و چیایان جووێ نەبووبێتەوە بەڵان، کە بەرز بۆوە دەبێتە هەور. دووکەڵ، تۆز و خۆڵ. خەم، خەفەت، پەژارە. تانەی سەرچاوان، پەڵەیێکی تەنکی سپییە بەسەر چاوان دەکشێ پەکی بینایی دەخات. ـــ ی سەرچاوان، لێڵایی، لێلاوی، تاری، بوغی چاو.

تماته

**تەما:** هیوا و چاوەڕوانی، ئارەزوو.

**تەماتا** (باک.): تەماتە.

**تەماتە:** (باک.) فەرەنگی. باینجانی سوور. کەسێکی گورچیلەکەی ناساز بێ دەبێ نەیخوا.

**تەمانم:** ئاخۆتن بە تووڕەبوون لە کاتی تووڕەییدا.

**تەمادار:** هیوادار، ئارەزوومەند.

**تەمادارى:** هیوادارى.

**تەمار** (زا.): ڕەگ وپەلى جەستە.

**تەمارتن** (زا.): شاردنەوەى چت لە ژێر گڵیدا.

**تەماشا:** شا، شاشا، بروانە، بڕوانىێ، چاولێکە. نۆڕیىن، ڕووانىین، تماشاکردن. چاودان، نیا، ڕێزە، تات. لێ نەڕین.

**تەماشاخانە:** پێشانگە. سینەما.

**تەماشاکار:** تماشاکەر، ڕامێن، چاودێر، چاڤدێر، برامان.

**تەماشاکە:** (بار.) هێڤکەرێ. بروانە: بنۆڕە، دێنکە، چاو، تماشا.

**تەماشاکەر:** تماشاکار. ــ ى: چاودێرى، ڕامان، تماشاکردن.

**تەماشاکەردەى** (هەورا.): تماشاکردن.

**تەماشاکردن:** تماشاکردەى، بەرتێکردن، ڕووانىین، نوواڕیىن، چاوپێداخشاندن، مەیزاندن، چاڤلێکرن، لێوستان، سەیرکردن، بەرێ خوەدان، چاوتێبڕین، ڕامان، چاولێ کردن، چاڤدێرى، باناندن، تێڕامان، نیاکردن، نۆڕین، مزەکردن، ڕامینان، نێڕین، نەیڕین، تێڕاندن، هێڕاندن. بە سووکى ــ : زەردەپێهاتن. بەرقەوە ــ : لێ مۆڕبوون، چیلەکردن، چاولێ هەڵگێڕانەوە.

**تەماشەگە:** بەرچاو، دیمەن.

**تەماکار:** تمادار، هەویادار، قوڕگ دڕیاگ.

**تەماکارى:** تمادارى، هەویادارى. (ئەردە.) قوڕگ دڕیاگى.

**تەماکۆ** (فە.، هەورا.، مەر.): تووتن.

**تەماڵ** (موک.): دیاردى، ناشکرابوون. دیارى کردنى نێچیرێک، کە ڕاو دەکرێ و بەدى کردنى، دەرکەوتن، پەیدابوون.

**تەمایارى:** چاودێرى.

**تەمەرە** (ئەردە.): قۆرت و بەڵا.

**تەمەرى** (باد.، هەکا.): تووالێت، کاکۆڵى سەرى پیاو و ژنان. تووکى سەرى منداڵانە، کە لەنێوانى ڕوومەت و گوێیدایە و ناتاشرێ لە گوونداناو (گولاڵى) یشى پێدەڵێن. (باک.) تەمبەرى.

**تەمەزى:** (باک.) لەچکى ئاوریشم، گەردنبەند. (زا.) دەستەسرى ئاوریشم.

**تەمەسى** (زا.): تەمەزى.

**تەمەڵ:** (هەورا.، ڕۆژ.) تیوەر، بێکارە، تەوەزەل. تەمبەڵ، تەنپەروەر. (فە.) بناغەى دیوار، بنچینەى دیوار. ــ دانان: بناغەدانان.

**تەمەڵە:** بناغەى دیوار.

**تەمەڵخانە:** بێکارخانە.

**تەمەڵى** (هەورا.، فە.): تەمبەڵى، لەشقورسى، بلەوەزى، سستى، تەوەزەلى، فسۆسى، خاوى، بێ کارەیى، تەپلۆسى.

**تەمەڵێت:** چتێکى پێچراوەوەیە، کە بە پاشکۆى وولاخاندابەسترێ. تمەڵە.

**تەمەن:** (چوا.، باد.) ڕست، ژیى. (کە.) سیرە. ماوە و ماوەداى ژیان. تەمەنى مرۆیان بەسەر چووار چینان دابەشدەکرێ ١) منداڵ لە ٢ تا ١٤ ساڵان. ٢) جاحێڵ لە ١٥ تا ٢٥ ساڵان. ٣) ناحێڵ لە ٢٥ تا ٥٠ ساڵان. ٤) پیر لە ٥١ تا کۆچى دووایى.

**تەمەندرێژ:** ژى درێژ.

**تەمەندرێژى:** ژى درێژى.

**تەمباز:** تەپۆڵکەیێکى گچکە، کۆسپە، کەمباز.

**تەمبازى:** کەمبازى.

**تەمباڤ** (باد.): گێژەن، گێژاوێکە، کە مەلەوان نەوێرێ خۆى لێدا.

**تەمبەرى** (زا.، باک.): تووالێت، کاکۆڵى سەرى پیاو و ژنانە، کە کرابێتە تووالێت، پرچ.

**تەمبەڵ:** (خۆ.) زەمتە. تەمەڵ، ترال، قوونفرە، بلەوەز، تەپان، بێ قوونەبان، تەواساو. (باک.) بێ کنگەبان، برانگوە، بەرانگیە. کەپەر، قەڵب، باپیڤان، بارهنگڤ. سست، بە قوونەقوون، چەل، سستەپەلە، تەوەزەل، خرس، فسۆس، قوونگران، خاو، خاوەخلیچک، بێ کارە، بلَح، خاولیچ، تەپلۆس، تەوەزەل، بێ قوون و هونەر، لەشقورس، بێکار. ــ ى: تمەڵى، خاوى، سستى، تەوەزەلى، تەواسانى، تەوەزەلى ترالى، باپیڤانى، خرسى، بێکارى.

**تەمبەڵخانە:** شوێنێکە تەمبەڵى تێدا بەخێو دەکرێ.

**تەمبوور** (باک.): تەمبوورە، تەموور، تەنبوورە.

**تەمبوورە:** تەموورە، (ڕۆژ.) تەمویرە. مرازێکى کەیف و ئاهەنگییە.

**تەمبووربازک** (باک.): تەمبوورژەن، تەمبوورڤان.

**تەمبوورژەن:** تەمبووربازک، تەمبوورڤان.

**تەمبوورڤان** (باک.): تەمبوورژەن، تەمبووربازک.

**تەمتەراق** (ئەردە.): گەورەیى و پایە بەرزى.

**تەمتەم:** (هەو.، پژ.، خۆ.) تەلاشەبەرد، جوورە بەردێکى ناسکە تەلاش تەلاش و تیلماسک تیلماسک لێک جووێ دەبێتەوە و هەڵدەوەرێ. (هەورا.) هارەینە. (هەو.) تەموّخ. بە هەموو جوورە بەردێکى ڕزیو و ناسکیش دەڵێن، کە زوو هەڵبوەرێ. شاخێکە بەردەکەى ڕزى بێ و هەڵبوەرێ. هەر زەوى و خاکێکى ئەو جوورە بەردانەى لێبێ هەر ــ ى پێدەڵێن و بەکارى کشتوکاڵ نایەت.

**تەمتەمە** (جا.، شا.): نووکە ئاسنەکەى مەزرەقییە.

**تەمراق** (لو.): ڕێک و پێک.

**تەمغە** (ڕۆژ.): (ڕۆژ.) داخمە، دامغە. دروشمێکە بە داغکردن بە ئاژاڵانیەوە دەنێن تا بزر نەبن و بناسرێنەوە.

**تەمراندن** (باک.): کوژاندنەوە، خامۆشکردن. بتەمرێنە.

**تەمربین** (زا.): بتەمرێنە، تۆپێن.

**تەمرین** (باک.): کوژانەوە.

**تەمس:** تووش. خشان. ــ کرن: پەلاندن، دەست لێدان.

**تەمشک** (ئەردە.): تووڕک، دڕى.

**تەمشۆ** (ڕەوا.، هەو.) تەشووێ.

**تەمشوو:** تەشووێ، تێشە.

**تەموو:** دارێکى ئەستوورە هەڵدەکۆڵرێ پەڕەى ئاشى تێدەخرێ، تۆپى ئاشى. تەنیشت، لاقەبرغە.

**تەمۆ:** بروانە: تەموو.

**تەمۆخ:** بڕوانە: تەمتەم.

**تەمووخ:** تاوێرە بەردێکە لە لم پەیدا بووبێ.

**تەمووره:** تەمبووره، مرازێکە لە ئامرازی مۆزیقە و ملی درێژە.

**تەمووره‌ژەن:** کەسێکە تەمووره باش لێبدات.

**تەم و فیز:** تەنقەنە.

**تەم و مژ:** تەپ و مژ، تەپ و لوول.

**تەمویره (ڕۆژ.):** تەمبووره.

**تەمێ:** تەمبێ، سزادان لەسەر هەڵە.

**تەمیان (ئەردە.):** خەم داگرتن، داتەمین، پەشێوبوون.

**تەمێبوون:** عارنان و پەند وەرگرتن، تەمبێ بوون.

**تەمێ خوواردن:** تەمبێ بوون.

**تەمێخۆر:** کەسێکە تەمبێ بووبێ.

**تەمیز:** خاوێن، پاک.

**تەمیس:** خاوێن، پاک.

**تەمیشک (ئەردە.):** توورک، تووترک.

**تەمێکردن:** تەنبێ کردن، عار بەیەکێک نان.

**تەمین (ئەردە.):** خەم داگرتن. تەمیان.

**تەن:** (فە.، ژا.، هەورا.، موک.) بەشەن، بەچک، لەش، قالب، بەدەن، جەستە، ئەندام، ئەننام. (ڕەوا.) کۆم، نێـو قوونـی مرۆڤانـە. (بـاک.) ڕەنگ.

**تەنا (باک.):** تەنها، تەنێ، تەنیا.

**تەنابـاز:** تەنافباز، داربـاز. ـــ ی: تەنافبازی، داربازی.

**تەناف:** ڕستەی جلکان، کە ڕادەنگێورێ، پەت، گوریسێکە، کاڵای تـەڕی لەسەر هەڵدەخرێ بۆ ووشککردنەوە. ـــ ی سێدارە: پەتی سێدارە.

**تـەنافباز:** تەنـباز، کەسێکە لەسـەر تـەناف گەمـەی بکـات. ـــ ی: تەنبازی. گەمەکردن لەسەر تەناف.

**تەنافهۆن:** ڕستە هۆنەوە.

**تەنافی پووشی خورما:** پەتی پووشی خورما.

**تەنافی جل هەڵخستن:** ڕستەیێکە کاڵای تەڕو شۆراوی لەسەر هەڵدەخەن.

**تەنافی چادر:** ڕستەی چادران.

**تەنافی شەیتانی (ئەردە):** مەچیرشەیتان، مەچیر ڕۆجیار، داوێکە باریک وەکوو هی تەونی جاڵجاڵۆکە لەکاتی گەرمایەدا لە حەوا پەیدادەبی.

**تەنافی کەشتی:** ڕستەی کەشتی.

**تەنانە:** تەنانەت، تا، هەتا.

**تەنانـەت:** بـەڵان، بـەڵام، تایـەکاری، بەتایبـەتی، تـەنها، بەتـەنها، تەنیانەت.

**تەنانی (ڕۆژ.، ژا.):** جسمانی.

**تەناهی (باک.):** تەنهایی، گۆشەگیری.

**تەنایی:** تەنهایی.

**تەنە (ئەردە.):** تەن، لەش.

**تەنەباز:** تەنافباز. ـــ ی: تەنافبازی.

**تەنەک:** تەنەکە.

**تەنەکار:** بۆرەکانی.

**تەنەکـە:** لـە تەنەکەوەیـە تەبەقـە ئاسـنی تـەنک. کانێکیشـە تـەنک دروستدەکرێ، تەنەکـەی نـەفت و بـەنزین و ڕۆن و ئیـتر لـەو دروستدەکرێ. (ئەردە.) بەس، بستی تەنەنگ.

**تەنەکـەچی:** (بـاک.): تەنـسـاز، تەنـەکچی. پیلـەوەر. (هـەورا.) تەنکەچی.

**تەنەکەچێتی:** تەنەکسازی.

**تەنەکساز:** تەنەکەچی. ـــ ی: تەنەکەچێتی .

**تەنەکی (ئەردە.):** تاک، تەنیا، تاق.

**تەنەوپەسپەسەکۆڵە (هەورا.):** تەونی جاڵجاڵۆکە.

**تەنەی دار (ئەردە.):** بنەدار.

**تەن بەتەن:** بەرانبەری دووکەسان لەگەڵ یەکتری بەبێ یارمەتیدەر. ئازاد ـــ دەرەقەتی فەرهادی دێت.

**تەنبەکی (زا.):** تووتنی نێرگەلەیە.

**تەنبەڵە:** تەمەڵە.

**تەنبەڵی:** تەمبـەلی، سسـتی، خـاوی، تـەوەزەلی، تەواسـانی، تـرالی، باپیڤانی، خرسی، بێکاری.

**تەنبوو:** گەنە. تەمو.

**تەنبوور:** تەنبوورە.

**تەنبوورە:** تەنبوور.

**تەنبوورڤان:** تەنبوورژەن.

**تەنبووری:** کاکۆڵی پیاوان.

**تەن پەروەر:** کەسێکە هەمیشە بە خوواردن و پۆشین و حەسانەوەی خۆیـەوە خەریک بێ.

**تەن پەروەری:** پەروەردەکردنی جەستە بە خوواردن و خوواردنەوە و پۆشـین و حەسانەوە.

**تەنپەری:** لەشپەری.

**تەنتەڵ (پێن.):** دێوەزمـە، غوول، دێوەزمۆکە، مۆتە، مێردەزمـە.

**تەنتەنـە:** خشـڵ و کـەل و پـەلی جوانـی، فیـز و هـەوا و دەمـار. دەبدەبـە، شکۆ، ئاهەنگ. پڕ ـــ: پڕشکۆ، پڕ ئاهەنگ.

**تەنجەری (باک.):** مـەنجەڵ، دیزە.

**تەنخووا (جا.):** ماف، لـەجیات. بۆ وێنـە: شـووانێک کچـی خاوەندمـاڵی خراوکرد دەنگ نەکرا، ماینەهاڵ (شێ) ی کـوژت دەنـگ نـەکرا بـەڵان، کـە سـەگە بەڵەکەکـەی کـوژت خـاوەند مـاڵ بەگەفـەوە پێـی ووت: خاتـەت خەراوکرد دەنگم نـەکرد، ماینەهاڵـەت کوژت دەنگم نـەکرد وەخووا ئەشێ گەماڵە بازگ بسەنم لێت. مایە، سەرمایە. تەنپەروەر.

**تەنەدردان:** مـل داکێشان، دڵخۆشبوون.

**تەندرووس:** تەندروست.

**تەندروست:** تەندرووس، لـەش ساخ، لـەش پتەو. نێڤنۆتە.

**تەندروستی:** لەش ساغی.

**تەندرووسی:** تەندروستی.

**تەندوور:** (ڕۆژ.، هەورا.) تەنوور. (باک.) ئارگوون، ئارتوون، ئێتوون.

**تەندوورە** (کە.): ـــ ی ناش: قۆتەرە، قۆرتمرە، چالاوێکی قووڵ و فراوانە لەبنەوە تا سەرەوە دیـواری دەورەکـەی بـە قـوڕ و بـەرد هـەڵدەچنن لـەجیاتی دۆلاشییە. تەنوورە.

**تەندوورەزەنان:** بەگێژەن و نەڕەنەڕ و گرمەوە.

**تەندوورەزەنە:** گێژەنک، گێژینە، گێژەن. گێژەنگە. گێژاوی گۆمـی ڕووبـار و چۆمانە.

**تەندوورەزەنە:** تێرەتی، تەڵەزگە، بقە. گەردەلوولـە.

**تەندوورەسوورکێ** (هەو.): گەمە و یاریەکە.

**تەندوورەی خراپ** (هەو.): کەری بەتەندوورە، گەمەیێکە.

**تەندووری‌پلاو:** جوورە پلاوێکە.

**تەنراو:** چتی تان و پۆدار، کە تەنرابێ. چنراو بۆ کالا و مافوورە و بەڕە.

**تەنز:** (باک.) تەنزی. شارێکی کوردانە لە نێوانی بۆتان و حەزران.

**تەنزەری:** لەش زێڕ، تەن زێڕ.

**تەنزێ** (باک.): تەنز.

**تەنشت:** تەنیشت.

**تەنشتەدەر** (زا.): لاشیپانی دەرگا.

**تەنشتکی** (باک.): لەتەنیشت، لەکن.

**تەنشۆ** (باک.): تەختەشۆ.

**تەنک:** یەکباد واژەی ئەستوورییە، چتی شاش، بـلاو. ـــ بوون: تەپـسین. ـــ کـردن: تەپسـاندن. (ئەردە.) ناسـک. (ئەردە.) تـەڕ، ئـاوەکی. ـــ او: بووار، بڕ، ئاوی تەنک، ئاوی کەم.

**تەنکەچی** (هەورا.): تەنەکەچی.

**تەنکەزێو** (موک.): جوورە چەک و خشـڵێکی ئافرەتانـە، لـەوانـەیە نـاوی جوورە چەکێکی بووبێ.

**تەنکەکردن:** شاشکردنی شینایی پڕ بەهەڵکێشـانی لقـی نـاوبـەناو بـۆ ئەوەی شەتڵ یا دارەکان باش گەورەبن.

**تەنک و تیوال:** چتی زۆر تەنک.

**تەنکێ باوانم تەنکێ:** بەستەیەکە.

**تەنکێش:** نێوقەد بەند بۆ مرۆ و وولاخان. پشتێند، بیبن. تەنگە، تەنگا.

**تەنکێ شیرازی:** بەستەیێکی موکریانێ بووە.

**تەنکین:** نانی تەنک.

**تەنگ:** دەرە، ئەشکەوت. تیـوار، تەسک، بێ دەرەتـان. واژەی فـراوان و فرەیە بۆ ژوورو و پێڵاوگەری و ئیتر. ـــ پێ هەڵچنین: تەنگاوکردن. وە ـــ هێنان: تـەنگاوکردن. لەسـەنگ و بـەردنان. دەست ـــ : ئاتاج. ـــ ی: ئاتاجی. ترس، هەراس، پەشێوی. (ئەردە.) تەنگە.

**تەنگا** (ڕۆژ.): تەنگەی وولاخان.

**تـەنگال** (بـاک.): کـەنار، لێـوار، کەلەکـە، تەنیشـت. بەرقـەد: خەنجەرەک خستەبە ـــ ا خووە. بەرانبەر، هەڤبەر، بەردیلک.

**تەنگانە:** تەنگ و چەڵمە، چەڵەنگ، جەندەرە، سەرگەردانی. (کۆ.) ئـاپۆرە. (بـاک.) تـەنگاهی، تـەنگایی، تـەنگانی، دەراڤ، تەنگـەتاوی، قایە، سەختی، تێگیران.

**تەنگانەیی:** تەنگ و چەڵمەیی.

**تەنگاو:** تەنگەتاو، دەربەست، بێزار، (باک.) پیسۆر، ناچار. کەسێکە لـە تەنگانـەدابێ. ـــ بـوون: تەنگـەتاوبوون، زۆر بۆهـاتن. ـــ کـردن: هەڵپێچان، تەنگەتاوکردن، تاودان، تەنگ پێ هەڵچنین.

**تەنگاوتیلکە:** (هەورا.) تەنگەتیلکە، تەنگەوتیلـە. (خۆ.) تـەنگ و تیلەکە. تەنگەیەکە لەسەر بار و سەربار یا کوڵەوە ببەسترێ.

**تەنگاوی:** تەنگایی، تەنگانە.

**تەنگاهی** (باک.): تەنگانە، تەنگایی.

**تەنگایی:** تەنگاهی، تەنگانە، تەنگی، تەنگاوی، تەنگ و چەڵمە.

**تەنگە:** تەنکێش. جێگای تەنگە. بە کەمـەرو نێوقـەدی وولاخـی دەڵێـن بـۆ مرۆیـانیش بـەناوی سـووکایەتی بـەکاردەبرێت. قایشـێکی پانـە زیـن یـا کورتانی وولاخی پێ قایم دەکرێت لەژێر زگـی. پـەتی تەنگـە، تافتـەنگ، تافزە. بەشە دەریایە، کە بە تەنگی کەرتبێتـە نێـو دوو خاکانـەوە، دەرووی تەنگی دەریا. بە ـــ وەبوو: چاو پێوەبوو، چـاو تێوەبـوو. (باڵـە.) کێشـێکە بەقەدەر هۆقەیەکی. مرازێکە لە کەرەستەی جووتی. (ئەردە.) پشتیوان.

**تەنگەبەر:** گەروو، شوێنی تەنگ و تەسک.

**تەنگەبەری:** تەنگی و تەسکی.

**تەنگەپێهەڵچنین:** تەنگپەهەڵچنین، زۆرهێنان بۆ چتێک.

**تەنگەهەڵکێش:** قایشێکی باریکە بە زینەوە تەنگەی پێ قایم دەکرێ، تا زینەکە نەکەوێت.

**تەنگەتاو:** گیاندارێکە لە ڕوویەکەوە زۆری بۆ هاتبێ و گیری خوواردبێ.

**تەنگەتاوبوون:** گیرخوواردن، تەنگاوبوون.

**تەنگەتاوکردن:** تەنگاوکردن، گیرکردن، بەگیرهێنان.

**تەنگەتاوی:** تەنگاوی.

**تەنگەتیکە:** تەنگەتیلکە.

**تەنگەتیکلە** (ئەردە.): کەم چیکڵدانە.

**تەنگەتیلکە** (ڕۆژ.، بابا.): قەڵـەوێکی خڕوپڕە، کە نـەتوانێ بجووڵـێ. تەنگەتیکە، تەنگاوتیلکە. تووڕەو سەرگەرمی.

**تەنگەتیلکەدان:** تووڕە و سەرگەرمی کردن.

**تەنگەخەری:** دەربەند. جاندار، شاگرد دارۆغە. پۆلیس.

**تەنگەدان:** تەنگە بەستنی وولاخ.

**تەنگەکێشان:** تەنگەکێشانی وولاخ، تەنگبەستن.

**تەنگەگرتن:** مـەبەس لـە دڵگیری یەکێکییـە لـە ووتـار یا لـە کرداری یەکێکی تر لەڕووی سووکییەوە دەگوترێ.

**تەنگەلان** (ئەردە.): لەڕووی تەنگی دەریا، تەنگەوەری، دەرگە، دڕناڵ.

**تەنگەنەفـەس:** پشووسـووار، هەناسـەتوند. ـــ ی: پشووسـوواری، هێنکەبڕ، هانکەهانک، پشووتەنگی، هەناسە توندی، هەناسەبڕکێ.

**تەنگە و تیلکە:** (هەورا.) تەنگەوتیلە.

**تەنگەوکەرە** (ئەردە.): دەرمانێکە ژنان بۆ تەنگکردنەوەی ئەندامی شەرمیان بەکاری دەبەن.

**تەنگەهەڵکێش:** چەرمێکی باریکە تەنگەی پێ قایم دەکرێ.

**تەنگ پێ هەڵچنین:** زۆر بۆ هێنان و لا لێبڕینەوە.

**تەنگدان** (ئەردە.): پشتدانەوە، پشتیواندان(بە دیوار و ئیتر). تەنگبەستن بۆ وولاخ. کوشین، گوشانن.

**تەنگدەس:** تەنگدەست.

**تەنگدەست:** دەست تەنگ، هەژار. ــ ی: دەست تەنگی، هەژاری.

**تەنگدەسی:** دەست تەنگی، هەژاری.

**تەنگز:** درەختێکە بالاّ بچووکی دڕکاوییە بەرێکی هەیە وەک چووالە، بەلاّم تاڵە بە خۆشکراوی دەخورێ.

**تەنگ و تێلەکە** (خۆ.): تەنگاو تیلکە.

**تەنگ و چەڵەمە** (جا.، ڕۆژ.): کۆلێژ، تەنگانە، ناخۆشی ڕۆژگار، تەنگی، سەختی، سەخڵەتی، تەنگایی، شێواوی، چەلەنگ، ناستەنگ، بگرەوبەردە، کێش، بێ دەرەتانی. تووشی ــ بوون: تووشی کێشە و بگرەوبەردە بوون.

**تەنگهاتن:** تەنگاوبوون، زۆر بۆهاتن.

**تەنگهاووردن** (ئەردە.): تەنگاوکردن، هەراسانکردن.

**تەنگەهەڵچنین:** تەنگاوکردن، زۆر بۆهێنان بۆ چتێک و لا لێبڕینەوەی.

**تەنگی:** تەنگانە، تەنگ و چەڵەمە، بێدەرەتانی، سەختی.

**تەنواوی:** مرۆی چڵکن وبۆرەڵووک.

**تەنوور** (ڕۆژ.، هەورا.، باک.): تەندوور. کەندوێکی لە قوڕ دروستکراوبێ ئاگری تێدا دەکەنەوە لە زەوی یا لە دیوار گیراوە نان و کولێرەی پێدەکرێ.

**تەنوورە:** جوورە کراسێکی ژنانە. نیو تەنە. (باک.) تەنووری. (ئەردە.) گێژەڵووکە. لوولدانی تەپ وتۆز و گێژەڵووکە. (ئەردە.) ئاخلە، ئالقە. چتی خڕوگرد، کۆمەڵە. دۆڵیانی ئاش، کەلەبەرد و قوڕ و قسڵ دروستکرابێ. ئەو شوێنەیە وەکوو (نێ) لە ئاشدا ئاوی دەچێتە ناو، ئاوەکە لە دەم گونجەکەوە بە تەوورژم دەردەچێت و لە تۆپی ئاشەکەی دەدا و دەیخولێنێتەوە. تەندوورەی ئاشی. هورروژمی باڵندانە لە هەواوە بەرەو خووار.

**تەنوورەوان:** تەنووروان، کەسێکە نانی بە تەندووریّ بکات.

**تەنووردا خستن:** هەڵگیرساندنی ئاگر لە تەندووریدا بۆ نان پێکردنێ. مەبەس لەوەشە، کە چەند کەسێک کۆببنەوەو بە خراپە باسی یەکێک بکەن.

**تەنوور شێوێن:** کۆڵە ووژ، کۆڵەوەژ، کۆڵووژ، کووڵە برێژ.

**تەنوورکوولووچەپزی:** کوورە، کوماج.

**تەنووری:** تەنوورە.

**تەنۆشک** (گەرد.، باک.): تەونی جاڵجالووکە.

**تەن وەمەن:** زل، گەورە، زەلام، کەڵەگەت. گۆشتن.

**تەنها:** سف، ڤاری، (باک.) بخووە. تەنیا، بەتەنێ، تەنێ، تنێ، تەک، تاک، تەنا. هەر. ــ دوو کەسن: هەر دووکەسن. ــ یی: تەناهی، تنەتی، تنەیی، تەنایی، بتەنێ. بە ــ : بەتەنێ، بتەنێ، جوداگانە، تەنانەت، تەنیانەت.

**تەنێ:** تەنها، تنێ، تەنیا. بە ــ : بەتەنها، بتەنێ، بەتەنهایی.

**تەنی** (باد.، خۆ.، دەر.، ڕەوا.، باک.): کرکڕ، دوودەی چرا و ڕەشایی بنی مەنجەڵێ، قورمی خانووە کۆنەکان. تەنیا.

**تەنیا:** تەنها، تەنێ، تا، بەتەنێ، تەک، تاک. بەس، هەر.

**تەنیباڵ** (ئەردە.): تاقانە، تاکانە.

**تەنیاگ** (ئەردە.): چنراو، هۆنراو.

**تەنیان:** چنران، تنران، تەنران.

**تەنیانەت:** تەنانەت، بەتەنهایی.

**تەنیایی:** تاکی، تەنهایی، تەکیایی.

**تەنیر** (فە.): تەندوور.

**تەنیشت:** لا، کن، ڕەخ، ڕۆخ، نەوک، لاتەنیشت، پاڵ، تەک، لای شان لە ڕاست و چەپی چت. لە ــ : لەکن، تەنشتکی.

**تەنین:** ڕاچاندن، چنینی وەکوو تەون، تێکهەڵکێشانی ڕایەڵ و پۆ.

**تەنینەوە:** بلاّوبوونەوە، لێگرتنەوە، پەرەسەندن، پژان، پرژان. (هەورا.) وەلاّبیەوە.

**تەو:** (ڕۆژ.، فە.) تا، نۆبەتێ. (باک.) بەر: بەرماڵەکە دوویەرە. (باک.) گۆڕ، ئارامگە. لە فەرهەنگی کشتوکاڵدا نووسراوە: مەڕێکە بنگوێچکەکانی قاوەیی بێ، مەڕێکە سەرو چاو و شان و ملی سوور و لەشی سپی بێ. (بابا.) مەڕێکە دەم و چاو و لەشی بۆرە تووک بێ. (بار.) بەردێکی قووڵە، کە ئاوی بارانەی تێدا ڕاوەستێ، (هەورا.) کەواو. (هەو.) هەرکەو. (ش.) مەڕێکە یا بەرخێکە، کە گووێ بابێ و پێی دەڵێن جسنە.

**تەوا:** لەکار کەوتوو، لەناو چوو، خراو. (باک.) چت، شت. (ڕۆژ.، فە.) تا نۆبەتێ. (ئەردە.) تەما، هەویا.

**تەوات** (زا.): لەسەرەخۆ.

**تەواتی** (باک.): پاشماوە، ماوەوە.

**تەواخووا** (باک.): ئەنوا، دارایی، سامان، چت، چتمەک.

**تەوادار:** تەمادار، هەویادار. ــ ی: تەماداری، هەویاداری.

**تەوار** (بابا.، ڕۆژ.، باک.) بازی مێ، بازی مێچکە، بەبازی نێر دەڵێن جوڕڕە. جووان و کۆک. گیانداری هەراش؛ منداڵەکە ــ بووە: منداڵەکە هەراش بووە.

**تەوارە** (دزە.): دەغڵی ووشک و پێگەیشتوو.

**تەوازۆ** (هەو.): داوای بووردن. ــ خووازتن: داوای بووردنکردن.

**تەواسان** (لو.): تاسان. (ژا.) پشووداان، پشی دان، سانەوە، حەسانەوە.

**تەواساندن** (ئەردە.): دڵساردکردنەوە.

**تەوسانن:** تەواساندن.

**تەواسانی** (هەورا.): تەمبەڵی، تەوەزەلی.

**تەواسو** (هەورا.): تەنبەل.

**تەواسیان** (ئەردە.): دڵساردبوونەوە.

**تەواسینەوە** (ئەردە.): تەواسیان.

**تەواش** (باک.): چەوری. ــ زاد داپاش. ڕۆنی زەنگ، ڕۆنی تواوە، ڕۆن. (باد.) چەورور، دەڵێن: زاد داپاش.

**تەواشا**: تەماشا.

**تەواشیر**: تەباشیر.

**تەواڵ** (باد.): باڵندە، تواڵ، وەکوو دەڵێن تەیروتەواڵ.

**تەوان**: تووان، توانایی.

**تەوانا**: هێزدار، بە دەسەڵات، توانا.

**تەوانایی**: دەسەڵات، هێز.

**تەوانج**: توانج.

**تەوانچە** (ئەردە.): دەمانچە.

**تەواندن**: تەوتەو گوتن. کاتێکی یەکێک گۆرانی بڵێ گوێدێران، دەڵێن تەوتەو (ئافەرین).

**تەواندن** (باک.): قەدکردن، چەماندنەوە. بتەوینە: قەدکە، بچەمێنەوە.

**تەوانگ** (باک.): دوورکەوتنەوەی ئەستێرە یا ڕۆژ لە خەتی ئیستیوا.

**تەواو**: ئامادە، تەیار. خڕخشت، خشت، گشت، خڕ، پاک، تێکڕا، هەموو، تەخت، تەکووز، دەق، بەدەق، تەف، (باک.) گوزیر، گزووز. ڕەبەق. دوایی هاتن. ــ بوون: دروست بوون، سەرکەوتن. قەدیان، پڕانەوە، کۆتابوون، چێبوون. لێ بوونەوە، دەست بەربوون، دوایی هاتن، پڕبوون. نا ــ: نیڤچۆ، نیڤچە. (باک.) پاندرووس. نا ــ ی: ناگوزیری، دەستکورتی. کۆتایی، پایان، دوایی.

**تەواوکردن**: کۆتاکردن، پێکهێنان، دوایی هێنان، بڕینەوەی چتێک. ئەنجامدان.

**تەواوتەرک** (هەورا.): بە داخزان و لەجێ چوونی هەردووک سمی وڕلاخی دەڵێن.

**تەواوی**: گردی، گشتی، خڕی، هەمووی، تەکووزی، خشتی، پاکی. گوزیری، گوزووزی، یەکجاری، دروستی.

**تەوە** (هەورا. کۆن): تۆ، ئەتۆ، توو، تە.

**تەوەر**: (ئەردە.، هەورا.): تەوەرە.

**تەوەرە**: (گەرد.) تەورە، تەوەر، ئاسنێکە لەسەر نیوەڕاستی بەرداشی دادەنرێ. خولگە. دارێکی کونداره لە کونی بەرداشی سەرەوەی ئاش گیر دەکرێ و بلوسکی تێ هەڵدەکێشرێ بۆئەوەی بەرداش بگەڕێ. (ئەردە.) ئاشووب، هەنگامە، کارەسات، وەی، گێچەڵ، تەمەرە.

**تەوەرداس**: (ئەردە.) دەسەداس، دارپاچ. (باک.) ڕەوت، کاسووخ، کاسۆخ. (دەر.) مەسەر، تۆلاس. جوورە تەورێکی کلکلداری دەمپانە و کەوانەدار و تیژە داری پێ دەبڕێتەوە. ــ ی چکۆلە: ساتوورە، سادر.

**تەوەرزە** (ئەردە.): بە نەبات و قەند و خوێی سپی دەڵێن.

**تەوەرزین**: تەوورزین، تەبەر. جوورە چەکێکی دەروێشانە.

**تەوەرگ** (هەورا.): تەرزە.

**تەوەرگە** (هەورا.): تەرزە.

**تەوەرگەزێلە**: تەرزەڵووکە.

**تەوەزەل** (هەورا.): تەمبەڵ، سست، تەوەزەل. (هەورا.) زەمتە، تەواساو. ــ ی: تەمبەڵی، تەواسانی.

**تەوەس**: جوورە تووتنێکی ڕەشۆکی خوردە زۆر توند و تیژە ناکێشرێت. (ڕۆژ.) جوورە تووتنێکە پاڵشت دەدرێتە تووری تەوەس، کە لە ئێرانە. (فە.) دژە (جەهەننەم). دەڵێن: وەتوون و تەوەس.

**تەوەسانەوە**: خۆلادان، دووری کردن.

**تەوەشق**: تەشق، تەشک، تەوورژمی ساردی وگەرمی زەوی.

**تەوەق**: تەبەق، تەبەک، تەپکە، ئانەشان. تەبەقەی قاقەز و نیستر. دەردەگا. تەبەقی دارینە، کە گەفی تێدا پاک و بە با دەکەن و هەڵدەتەکێنن.

**تەوەقە** (ئەردە.): تەبەق(برین) ی زاری ماڵاتان.

**تەوەل**: سەرسەری، خوێڕی.

**تەوەن** (هەورا.): بەرد، کوچک، سەنگ.

**تەوەنە** (ئەردە.): کۆمەڵە.

**تەوەنەدان** (ئەردە.): کۆمەڵەدان، کۆبوونەوە.

**تەوەنتاش** (هەورا.): بەردتاش.

**تەوەنتراش** (هەورا.): بەردتاش. ــ ی: بەردتاشی.

**تەوەنو دۆزەخی** (هەورا.): بەردی جەهەننەمی.

**تەوەن و قسڵی** (هەورا.): بەردە قسڵ.

**تەوەنی** (هەورا.): بەرد.

**تەوەنی ئاهەک** (هەورا.): بەردەقسڵ.

**تەوەنی جەهەننەمی**: بەردی جەهەننەمی.

**تەوەنی ڕۆژنێ** (هەورا.): بەردەمەڕمەڕ.

**تەوەنی سیاوێ** (هەورا.): بەردی جەهەننەم دەرمانێکە برینی پێ دەبرژێتەوە.

**تەوتەو** (باک.): ئافەرین.

**تەوتەوە** (باک.): لاف لێدەر، بێکارە. سەرسەری.

**تەوتین** (باک.): ئارام و هێدی بوون، دڵدرانەوە، لەسەرەخۆیی.

**تەوخ**: ژێرزەمینێکی گەورەیە لە کوێستانان لەکاتی زستانێدا ئاژاڵی تێدەکرێ.

**تەوور** (جا.): دوو دەو، بیوور. (دەر.) دوو دەم. (گەر.) تەوەر. (باک.) هیچ کاتێکی، هیچ دەمێکی، بەجارێکی. (باک.) بیوور، بڤر، بەڤر.

**تەورات**: تەورات، کتێبی پەیامبەر موسایە.

تەووردا‌س

**تەوراس**: تەوەرداس.

**تەورە** (گەر.): تەوەرەی ئاشی.

**تەوورداس**: تەوەرداس.

**تەوورزین**: تەوەرزین.

**تەوری** (باک.): دارێکە.

**تەوریز**: شارێکی گەورەی کوردستان بووە، ئێستا هەموو تورک زمانە ناوەکەی کوردییە: تا و لەمرزی نیە یا تێکڕا ڕەز و باخ و باخچەیە. ئاتڕپاتەگان، ئازەرپایەگان، ئازەربادەگان، ئازەرئابادەگان، ئازارئاباد. ــ ی: بەردێکی کێشانییە لە کوێستانێدا دووکیلۆ و ۵۳۲ گرامە. جوورە ترێیەکە.

**تەورین** (باک.): هەلاتن، تەقین، ڕەوین، خەوهاتن. بتەورە: هەڵبێ.

**تەووز** (باک.): گەیشتنی میوە و تەرەکاری پلە و قۆناغی هەرە بەرزی تەواوی.

**تەوزە** (ڕۆژ.): گەمە، قەشمەری. (ڕۆژ.) تەوسە. فشە، گاڵتە. ـــ پێ کردن: گاڵتە پێکردن.

**تەوزیم**: پێویستی، گەرەکی، ناچاری. ـــ نیە بچیە بەغدایە.

**تەووژم** (بابا.، شا.، هەو.، کە.): هێز، تەووشم، تین، هێز، ـــ ی ساردی. ناوەکە بە ـــ هات. تاڵوکە، پەلە، گوڕ، بە ـــ ڕۆیشت: بە پەلە ڕۆیشت. ـــ ی بارانە: گوڕی بارانە. بە ـــ : هێزدار، بەزەبر.

**تەووژمی خووێن**: هێز و زەبری جوولانی خوێن.

**تەووس**: کاس، جوورە بێهۆشییەکە دێت بەسەر ئادەمیزاددا بەهۆی ڕووداوێکەوە. تانووت، تانە، پللار، پلارە ڕەقە. لە ئاخۆتندا پلار بۆ کەسێک ئاوێژتن بەو مەرجە، کە هەموو کەسێک تێینەگات. واژی، پێچەوانە. بە ـــ موە: بە پێچەوانەوە.

**تەووسانەوە** (جا.): تۆزانەوەی دەم و لووت.

**تەووس ئاوێژ**: تانەلێدەر، پلارتێگر.

**تەووسکە** (کۆ.، خۆ.): جوورە هەنجیرێکە هەمووی وورده بە دارەکەشی دەلێن تەووسکە، هەنجیرە کێویلەشی پێدەلێن. (باد.) تقسک.

**تەووش** (باک.) پووچ، بێ نرخ، بێ واتا، بێ سوود. (باد.) جوورە نەخۆشیەکی وەبای مرۆ و ماڵاتانە. ئازار.

**تەووشق**: تەشق.

**تەووشک** (ئەردە.): مەشقی سەرمای زستانێ. سەختی سەرمای زستان.

**تەووشم**: تەووژم.

**تەوشوو**: تەشووێ.

**تەوشووێ**: تەشووێ.

**تەوشێ**: تەشوێ، تەوشووێ.

**تەوشی**: تەشووێ.

**تەوغی** (موک.): لەکاتی جگێنێدا بەکاردەبرێت.

**تەوغێن**: جوورە یاری کردنێکە بە میچ (جگ).

**تەوق**: تۆق. تۆقێکە لە ئاسن یا لە دار یا لە دەست یا لە مل دەکرێ. بەلا، گێچەڵ، گاپۆرە. لا تەنیشتە لووسەکەی جگییە. تەوقە، چتێکی دوو فاقە لە زێڕ یا لە زیو یا لە باغە ژنان لە ئەگریجەیانی دەدەن تا تێک نەچێ. (ئەردە.) ملوانە، گەردن بەندی دیل و نێخسیران.

تەوقە

**تەوقات** (کۆ.): شەپەلاغە (زللەی پشت ملییە).

**تەوقە** (کە.، خۆ.): گەمەچی، مرۆی قسە خۆش. تەوقی پرچی ژنان، تۆقەی پرچان.

**تەوقەتە**: تەپڵەسەری چتان. تۆقەسەری هەموو چتێکی. (ئەردە.) توقەسەر، تەپڵەسەر.

**تەوقەسەر**: تۆقەسەر، شوێنی هەرەبەرزی سەری مرۆیان و دیوار و گرد و چیایان و ئیتر.

تەوقەکردن

**تەوقەکردن**: دەست لەناو دەست کەسێکی نان و کوشینی لە ڕووی تاسە و خۆشەویستییەوە.

**تەوقەن** (ئەردە.): تەوقەنە. پەڵە دەغلێک، پارچە زەوییەک یا شیناوەردێک.

**تەوقەنە** (ئەردە.): تەوقەن.

**تەوق سەر** (ئەردە.): تۆقەسەر.

**تەول** (باک.): زەرداو. تەویلە.

**تەولاندن** (باک.): لە تەویلەکردن. بتەولینە.

**تەوڵە**: نێوچاوان. تەویلە.

**تەولباز** (باک.): باز، هەڵبەز. ـــ لخوەدان: بازدان، هەڵبەزین.

**تەوم** (باک.): تەگبیر.

**تەومان** (زا.): دەمەرقۆپان، پانتۆڵ.

**تەوون**: (باک.) تەڤن. چنینی ڕایەڵ بە پۆ، کە بەدار تەونەوەبێ. ڕایەڵی بەڕە و مافوورە، کە بەدارەوەبێ بۆ تەنین.

**تەوونگەر**: (باک.) تەڤنگەر. تەونکەر. جوومەکار، کۆرسکەر، جوومەکثان، کەسێکە تەونی بکات. ـــ ی: تەڤنگەری، جوومەکاری.

**تەون و بەست**: فێڵ و فرلداغ، تەشقەڵە.

**تەونی جالجالووکە**: (باک.) تەڤنی پیرێ، داڤ. (باک.) تەڤنکا پیرێ، تەباتۆر، تەنۆشک. (باک.) تەڤنەپرک، پیر هەڤۆک. کونکا پیرێ.

**تەوی**: ئەشێ، دەشێ، گەرەکە.

**تەوێل** (هەورا.، جا.): نێوچاوان، ناوچەوان.

**تەویلە**: (ڕۆژ.) تاوڵە. (باک.) بنی. شتیر، کۆلیت، کۆڕنیت، گەوڕ. (هەورا.) پشتیر. تەوڵە، کووتان، گەلەخان. (زا.) ئاخێڕ. پاگەم، پانگەم. خۆکە. ژوورێکە وولاخی یەکسمی تێدەکرێ. تەویلەی ڕەشەوولاخان: کۆخ، گاگلدان. ـــ ی کەران: هەرخان.

**تەها**: تەحا، لەکاتی واق وڕمانێدا بەکاردەبرێت.

**تەهت**: (باک.) تات. نێولێهێنان، نیشانکردن، دەستنیشان کردن. تەختەبەرد.

**تەهسای** (باک.): خلیسکاو، هەڵخلیسکاو.

**تەهساندن** (باک.): خلیسک پێکردن، خلیسکاندن، هەڵخلیسکاندن.

**تەهسین** (باک.): خلیسک کردن.

**تەهل** (باک.): تاڵ، تاڵی شاری. (باک.) مەرێکە سەری زەردێکی سووک بێ و میل میلی ڕەشی تێدابێ.

**تەهلک** (باک.): تاڵک، تاڵکە. گندۆرە و خرچە و گرکەی نەگەیشتوو.

**تەهلۆبی** (باک.): گیایەکە. تەهلی.

**تەهلی** (باک.): گیایەکە.

**تەهیسەک** (باک.): خلیسککەر.

**تەی**: (هەر.) مەرێکە سەر و مل و لەشی گشت سپی بێ و هیچ پەڵەییێکی تێدانەبێ. (باک.) خێڵێکی کوردە و کۆچەرن لە کۆچەرانی میرانانە. لیتی، ماڵی، ڕام. (ئەردە.) ڕامبووی دەرهاتوو.

**تەیاخ** (ئەردە.): تێلا، لیس، پەیاغ، گارام.

**تەیار** (هەورا.): ئامادە، کۆک، بۆشناخ. ساز. (باک.) باغ. پارچە زەوی نزیک مالآن.

**تەیارە** (ئەردە.): نیشتگەی بازە، شوێنێکی تایبەتییە بازی لەسەر هەڵدەنیشێتەوە.

**تەیان**: دایەن، تایەن، دایە، کارەکەر، کلفەت، تیان. تیانچە، تیانە، مەنجەڵی گەورە.

**تەیەبووگ** (ئەردە.): مەردومی قالّی دەرهاتوو. لەکار ڕاهاتوو.

**تەیەبوون**: قالّبوون، دەرهاتن، ڕاهاتن، لەکار بەڵەدبوون.

**تەیتۆک** (باک.): قازەلاّغ.

**تەیجە** (ئەردە.): تەیکە، نانەشان. تریان.

**تەیرە** (فە.): جەردە، ڕێگر.

**تەیرەیی** (فە.): جەردەیی، ڕێگری.

**تەیرۆک** (باک.): تەرزە. بارانێکە بە تەرزەوە بباریّ.

**تەیری**: دەردێکە تووشی هەر ئاژاڵ و ماڵاتێکی بیّ بەلا دادیّ و سەرەنگریّ دەبیّ. (موک.) گێژی.

**تەیرین** (باک.): بیّ هەست وخوست بوون. سست بوون.

**تەیز** (باک.): گوشاد، فراوان، درێژکراو.

**تەیس** (باک.): ترووسکە، بریقە.

**تەیسان** (باد.باک.): تروسکان.

**تەیساندن** (باد.، باک.): تروسکاندن، بریقەدارکردن.

**تەیسین**: ترووسکان، درەخشان، بریقەدان. بتەیسە.

**تەیکە** (بابا): سەڵەیەکە وەکوو سینی وایە نان و چێشتی لەسەر دادەنریّ لە شووڵ دروستدەکریّ. پلاّوپاڵێوی تووڵین یا لە سرووت و پووشی گەنم دروستکراوە.

**تەیمان**: پەرژین، تانۆک، چەپەر. خەڵفەدارێکی باریکی درێژە ناوەندی قیسپی پیّ دەتەنریّ. چەپەرێکە بە تەیان و قیسپ چنرابیّ.

**تەین و لەیمان** (هەو.): نەخۆشیەکە.

**تەیوانە** (ئەردە.): خواردەمەنێکە، کە لەماڵی زاواوە دەنێردریّ بۆ ماڵی بووک لە ڕۆژی گوێزانەوەیدا.

**تبار**: تەبارە.

**تبتین** (شەم.): ددان بەجەرگی خۆداگرتن، پشوودرێژی، بێن درێژی، خۆگرتن، پشووخوواردنەوە.

**تبل** (باد.): قامک.

**تبلک** (باک.): گەمەیێکی کوردییە.

**تپ**: (باک.) تەپە، دەنگی لێدان یا کەوتنی چتێکییە. (باک.) لێدانی دڵە، دەنگی لێدانی دڵە. دەڵێن: تپ تپ ژ دلێ من تێ. تەپە.

**تپەتپ**: تەپەتەپ.

**تپل** (باک.، باد.): قامک، تەنگوست.

**تپلابەرانکێ** (باک.): تپلابەرانێ.

**تپلابەرانێ** (باک.): (باک.) تپلابەرانکێ. قامکە گەورە. (باک.) تپلکێ، ڕانکی. (دەر.) کەلە. (نەهـ.) تلیابەرانێ.

**تپلاشادێ**: (شکا.، نەهـ.) قامکی شادەی، تلیا شەهادێ.

**تپلانیوەکێ** (باک.): (باک.) تپلاناوێ. تپلانیڤەکێ. قامکی نیوەڕاستیّ، قامکی قووتیّ، نەرمەقووتە.

**تپلاڕۆخێ** (باک.): (شکا.، نەهـ.) برا تووتەڵە، برای تووتە.

**تپلاقچیلک**: تووتەڵە، قامکەتووتەڵە، (ئەردە.) تووتە. (شکا.، نەهـ.) قلیچ.

**تپلک** (باک.): تەپڵی گچکە.

**تپێن** (باک.): شلینک، شێلنک.

**تت** (باک.): چغە، بۆ دەرکردنی سەگان بەکاردەبریّ.

**تتن** (باک.): توتن.

**تجار** (باک.): چجار، قەت، تاقەجارێک.

**تخ** (هەو.): چش، قیرۆسیا. هیچ، پووچ. با نەبیّ چش، وازلیّ هێنان، چاو لیّ پۆشین. (ڕەوا.) لەقە، پەک. ــ تێدان: پەکخستن، لەقەلێدان.

**تخل** (ئەردە.): مەردومی کەنەفتی لەپێش چاوکەوتوو. بێکارە.

**تخم** (باک.): توخم. بنەڕەت، بنچینە، ڕەگەز.

**تخووب**: سنوور، شوورە، ناوان، چیلە، بەنک، درسەگ، جەسپەر، قەمتەرە. (باک.) تخوویب. تاڵخ. سنووری دوو زەوی یا دوو یا چەندین هەرێم و خاکانە.

**تخوون**: توخوون، نزیک، فەرە. ــ بوون: نزیک بوون. ــ کەوتن: توخوونکەوتن، نزیک بوونەوە.

**تخوویب** (باک.): سنوور، تخووب.

**تخێلّ** (موک.): درێژ، کشان. ــ بوون: درێژبوون، ڕاکشان. پاڵکەوتن.

**تد** (باک.): (باک.) تت.

**تر**: بایەکی دەنگداری بۆگەنە، کە لەناو زگدا پێچ دەخوا و بە داوێنی پشتەوەدا دەردەپەڕیّ. ــ کەندن: کەنن، کەندن، ڕاهێشتن. (باک.) ترکرن.

**تر**: ئیتر، دی، ئیدی، دیکە، کە، ئیکە، جودا، جیا. بەلاّن بەدووای ووشانەوە دەنووسیّ: ساڵێکی تر: ساڵێکی دیکە، پێنووسێکی تر: پێنووسێکی دیکە. مرازێکە بۆ بەسەرەدابوون بە دوای ووشانەوە دەنووسیّ: گەورەتر. گچکەتر، خۆشتر، بەرزتر، ئازاتر.

**تراد** (باک.): تەڕاد. شەڕنەخێوی. کەتن ترادی: شەڕنەخێوی کردنی سوواران.

**ترار**: (هەو.، باد.) جام، بادی ناویّ. (باک.) تەبەکی نانی، کە داریێ.

**ترارک** (باد.): دەوری.

**تراز**: هاوشان، تەراز. ــ کردن: ڕێک و پێک و تەرازکردن. (ئەردە.) جوورە گیرە و ئەشکەنجەیێکە، کە چتی پیّ توندەکریّ. تەرازووی بەنا. (ئەردە.) گیرە. بەشگا.

**ترازان**: داترازان، بەکەلی هاتن. جوێبوونەوە، لە شوێنی خۆ دەرچوون، لە جێگای خۆوەلا کەوتن. (دەر.) ترازیان.

**ترازاندن**: دەرپەڕاندنی چتێک لە شوێنی خۆی.

**ترازاو**: (دەر.) ترازیا. چتێکە لە شوێنی خۆی دەرچوویی.

**ترازوو:** بەرانبەر، زیوار. دوو چت، کە لە کێشان و هەڵسەنگاندنێدا بەرانبەر و تەخت و ڕێک بن. تەرازوو، هامار، تەخت. مرازێکە چتی پێ دەکێشرێ بە سێ و کیلۆ و ئیتر. بریتییە لە دوولنگە و شاهێن، کە هەریەکەی بەسێ بەندان بە شاهێنەوە بەستراوون. شاوولی بەننا و ئیتر. مرازێکە شووشە درێژ و بارێکی تێگیراوە و تنۆکێکیش جیوەی تێدایە بەرزی و نزمی و ڕاستی و چەوتی دیوار و ماکینە و چتی تری پێ دیاری دەکرێت. تەرازوو، چەند ئەستێرەیەکی ڕێکی بەرانبەری یەکترین لە نێوانی کۆ و گەلاوێژێدا. کەلوو (بورج) یێکە لە دووازدە کەلووەکانی ئاسمانێ.

**ترازووباز:** کەسێکە لەکاتی کێشان بەتەرازوودا فێڵ و ساختەبکات.

**ترازووبازی:** فێڵ و ساختەکردن لەکاتی کێشانی بەتەرازوودا.

**ترازی** (هەورا.): تەرازوو.

**ترازیان** (دەر.): ترازان، چورتیان. بەزین، شکان، هەڵاتن، پاشەکشە.

**تراش:** تاشین، تەراش. ـــ کردن: تراشین، تاشین.

**تراشان:** داڕووشان.

**تراشە** (ئەردە.): تەلاش، تولاشە.

**تراشراو:** تاشراو.

**تراشتن:** تاشین:

**تراشکەر** (باک.): بەردتاش.

**تراشین:** (باک.) ترێشتە، تراشتن، (فە.) تاشین، داڕووشاندن.

**ترافاندن** (ئەردە.): ڕاندن، شاردنەوە.

**ترافیاگ** (ئەردە.): ترافیدە.

**ترافیدە** (ئەردە.): گیاندارێکە، کە تار بوویێ. ترافیاگ، تاریاگ. دەرکراو، دەربەدەر، ئاوارە.

**تراق و ترووق** (لو.): شەق و شۆق، دەنگی لێدانێ.

**تراکێ** (باک.): دارێکە.

**ترالّ** (باک.): تەمبەڵ، تەوەزەل. ـــ ی: تەمبەڵی، تەوەزەلی.

**تران:** ترین، لێ بەربوون.

**ترانە** (باک.): تەرانە، قەشمەری، گاڵتە، گەپ لە دووان و وتووێژدا.

**تراندن:** ترێێکەندن، لێ بەردان. فێڵ لێکردن، دەستبڕین، ساختە لێ کردن.

**تراو:** چتی زۆر شل و ڕوون، کە بەشی ئاوی زۆرتر بێ.

**ترە** (باد.): ترێ.

**ترەختە** (ئەردە.): تەرختە.

**ترەتر:** ئاخۆتنی قۆڕ و بێ جێ. خۆ هەڵکێشان وفیز و دەمار و منەت بەسەر کەسێکیداکردن. چ ترەترێکی بەسەر دادەکەی؟

**ترەشتە** (هەورا.): تەشووێ.

**ترەقان:** تۆقین.

**ترەقاندن:** تۆقاندن، تەقاندن.

**ترەقە** (هەورا.، بابا.): چەشنی، تەرەقە.

**ترەقە:** تریقەی پێکەنین.

**ترەق و تروق:** تەق و تۆق.

**ترەقیان** (ئەردە.): پێکەنین. تریقەی پێکەنین.

**ترەقێن:** کەسێکە چتی بتەقێنێ.

**ترەک** (ئەردە.): درز وقەڵشی چت. شەق، قەڵشتی دەست و پێ.

**ترەک** (باد.): پیاو و ژنی داوێن پیس.

**ترەکان:** درزبردنی چت و قەڵشینی پێستی دەست و پێ و ئیتر. ترەکین. زانی سەگ و گورگ و وورچ و چەقەڵ و بەراز.

**ترەکاندن:** وەترەکان خستن. درکاندن، قەڵشاندن.

**ترەکانن:** ترەکاندن، درزپێ بردن، درزتێ بردن. قەڵشاندنی دەست و پێ. گۆپکەکردنی داران. ترەکاندن.

**ترەکای تووتەی** (هەورا.): ترەکینی سەگ.

**ترەکای دەڵێ**(هەورا.): ترەکینی دێڵەسەگ. (هەورا.) ترەکای تووتەی.

**ترەکەڵەک:** کاری بێ بنج و بناوان، نیشسی بێ جێ، کارێکە لەبەر بێ بنج و بناوانی لەرانبێ سەرنەگرێ و بڕووخێ. تەڵەزگە، بقە.

**ترەکەڵەکی:** کاری بێ بنج و بناوانی. نیشی بێ جێ.

**ترەکیان:** ترەکان. ترەکین، درزبردن، قەڵشین. گۆپکەکردنی داران، کە کاتی وەی بێ گەڵابکات.

**ترەکین:** (فە.) هێلکە هەڵهێنان. ترەکان. (موک.) قەڵشینی دەست و پێ و درز بردن. زانی سەگ و گورگ و وورچ و ئیتر. ترەکان.

**ترەماش:** تەرەماش. بۆ جنێویش بەکاردەبرێ: فیسارەکەسەی خوواردووە: واتە هیچی نەخوواردووە.

**ترەمەڕۆ:** بریتییە لە تفەنگ و دەمانچەیێکی خراو، کە گوللەی کەم بڕوات.

**ترنجەمین:** گەزۆ.

**ترو** (هەورا.): توور.

**ترووزە:** کورکورە، کەڕەواڵە. قەتێ، باڵندەیێکی کونجەی زەردی گۆشتخۆشە، بەقەد کۆترێکی دەبێ.

**تروکە** (هەورا.): خەرتەلە. گیایەکی بەهارییە لە چەشنی گەڵا و تامدا وەکوو گەڵای تووری وایە.

**تروووڕوێ** (ئەردە.): چەنەباز، زۆربڵێ، زۆر وەڕ، سازندە، ووڕاج، ووڕلێدەر.

**ترووی** (هەورا.): توور، تفر.

**تربەسپی** (باک.): بڕوانە: ترپا سپی.

**تربەسپی:** گوندێکە لە ڕۆژهەڵاتی قامیشلوویە چونکوو خاکەکەی سپییە بۆیە ناونراوە تربەسپی.

**ترپ:** (هەورا.) توور. (باک.) گوێز. گوێزچە.

**تربووس** (باک.): شەئم، نیم. شێ.

**تربێ** (هەورا.): شەوی ناوەڕاستی زستانییە.

**ترپ:** زرم، دەنگی کەوتنی چتێکی. (فە.، ڕۆژ.، جا.) توور. (باک.، ڕەوا.) تلّپ، تلّپاس، ترپاس، تلّتەی کوشراو یا مژراو.

**ترپاس:** ترپ، تلّپ، تلّپاس، تلّتەی کوشراو یا مژراو.

**ترپان** (باد.): داسێکی درێژەو دەسکیشی درێژە.

**ترپەنكێش** (باد.): دروێنەكار، پاڵە.

**ترپە**: هەست، خوست، زرمە، تپە، هەستی پێ. دەنگی كەوتنی دڵۆپە یا چتێكی قورسی نەرمە لە بەرزییەوە.

**ترپەترپ**: ترپەی یەک لەدووای یەكتری، زرمەزرم، تەپەتەپ.

**ترپژن** (خۆ.): دەنگی كەوتنی چتێكییە، شرپژن. دەنگی ترپیە.

**ترپۆكە** (هەورا.، ئەردە.): شێلم.

**ترپوهۆڕ**: ترپە و هۆڕ.

**ترت**: تورت وەكوو تامی مزر و تێكوڵە هەنار و ئیتر. (ئەردە.) قامک، ئەنگوست. (باک.) تڕ.

**ترتـەپان** (ئـەردە.): تەمبەل، تـەوەزەل، سست، لـەش گـران. ـــ ی: تەمبەڵی، تەوەزەڵی.

**ترتەمانی** (هەورا.): پزدان. میزدان، میزەڵدان.

**ترتره** (باک.): مۆتۆرسایكل، ترترۆک. گـەورە، زەلام، لەندەهۆر، بەقەلافەت. مرۆی درێژی قەڵەو. (كۆ.) گیایەكی ڕەنگ زەردی بێ گەڵایە وە زریزەی مێـوی دەچێ، لـە هـەر شینایی و مێوێكـی بـدات ووشكی دەكات، دەكرێتە حسیر زۆرتر لەنێو پەمۆدا شین دەبێ. (بڵ.) جلە. دەردێكە لە هەندێ سەوزایی دەدات ووشكی دەكا.

**ترترک** (باک.): ترترۆک. بۆڕی خواردن.

**ترترۆک** (خۆ.): ترتره، مۆتۆرسایكل. (باک.) ترترک. سوورێنچک، (باک.) بامەلیشک. (باک.) ئووربەڵیشک.

**ترتری** (باد.): مەردومی تڕ.

**ترتۆپ**: ترزل، بەهەوا، فیزدار. بەفیز.

**ترتیزک** (باک.): كارگە و ئەنباری باڕووتی.

**ترچماق**: مرۆی زۆر درێژ.

**ترح** (باک.): لكە تازەكانی دارانە.

**ترحێو**: ترهێو.

**ترخ** (ڕەوا.): هەرچتێكی هەڵبوەرێ ترخەی پێدەڵێن.

**ترخان**: (لو.) ترخێنە. (باک.) تەرخان. ئازاد. ـــ كرن: تەرخانكردن.

**ترخانی** (باک.): تەرخانی، ئازادی زمان و ئیتر.

**ترخە**: ترخ. تێكچوونی دەروون و ترشانی خواردەمەنی لە چیكلدانـەدا بەهۆی زۆر خواردن و ئیتر.

**ترخێنە**: (ڕۆژ.) تەرخێنە. (هەورا.) شەلەمین. چتێكی مزرە لە بروێش و شێلمی ئەنجراو دروستدەكرێ و دەكرێتە سەلک سەلک. چێشتێكیشە لە ترخێنەی ووشک و نیسک و نۆک و چەوەندەر و گۆشت دروست دەكرێ.

**ترزل**: كەسێكە تڕی زل بكەنێ. ترتۆپ، فیزدار، بەفیز، بەهەوا. گونـە. ـــ ی: فیز، هەوا.

**ترس**: باک، پەروا. (باک.) سام، ساف. هەراس، ئەنیش. بارێكە دڵی مرۆڤان دەخاتە لەرزەو گورپەگورپ بە هۆی دیتن یا بیستنی چتێكی وا، كە گیان لێیی بڕەوێتەوە. بە ـــ : سامدار، سامناک. بێ ـــ : بێ باک، ڕووقایم. ـــ شكاو: شێرگیر، بەدەمەوەدراو. دەترسم: ترسم هەیە، ترسامن هەیە. لە خودا ـــ : خوداناس، پارێزگار لە تاوان.

**ترسان**: (دەر.) ترسیان. (باک.) بـەهتین، ترسین، بـزدان. جـەڵفین. پرینگـان، پرینگانـەوە. تۆقـان، تۆقـین، زراوچـوون. جـەنقین، جنقـین، هەژقین. كەم دڵی، بێ زاووری.

**ترسـاندن**: تۆقـاندن، زراوچوونـدن، ئـاوی دەمـدان، ئـاوی چـاودان، هەڕەشەلێكردن، هەروگیف لێكردن، پرینگاندنـەوە. (باک.) جەفلاندن، بەهتاندن، جەنقاندن. (باک.) بزداندن، بزدهاندن، جنقاندن. هەژقاندن، فـەرهاندن، دلهـاندن، تـرس خسـتنە دڵـی یەكێكیـەوە. (ئـەردە.) هەڕەژەكردن.

**ترسانن**: ترساندن.

**ترساو**: زراوچوو، زەهلەبراو، ترسێنراو.

**ترسەترس**: پارێزگاری و خۆگرتن لە چتێكی سامدارەوە: ئارام بۆچی بە ـــ دەچێتە ژوورەوە.

**ترسەزاڵ** (هەورا.): ترسەنۆک.

**ترسـەنۆک**: ترسـۆنەک، بێ زاڵـە، دڵسست، بێ جـەرگ، نـەوێرەک، نەوێرۆک، نـەوێر، ترسیاو، ترسـەزاڵ، ڕەوەک، زەبوون، ترسیار، (باک.) بەزدۆنەک، بـزدۆک، بزدونـەک. ترسۆ، ترسۆک. تروسک، ڤرچاڵـە، دلكەچک. ڤرچالە.

**ترسەنۆكی**: ترسۆیی. (باک.) بەردۆنەكی. هولۆڵی.

**ترسەدەر**: ترسێن.

**ترس شكاو**: كەسێكە ترسی نەمابێ.*

**ترسناک**: كەسێكە یا چتێكە مەترسی لێ بكرێ.

**ترسنۆک**: ترسەنۆک ،بێدڵ، كەم زاوور، كەم زات، بێزات.

**ترسۆ** (باک.): ترسەنۆک.

**ترسویی**: ترسەنۆكی.

**ترسی** (شكا.): ووشكی، ئیشكی: نانی ـــ : نانی ووشک واتە نـانی بێ پێخۆر.

**ترسیار**: ترسەنۆک.

**ترسیان**: ترسان.

**ترسێن**: ترسێنەر، زەهلەبـەر، ترسـدەر، بەسام، سامدار، (باد.) بـترس. زاتبەر، زاروبەر.

**ترسین**: ترسان.

**ترسێنەر**: ترسێن، كەسێک، چتێكە مـەردومی بترسێنێ.

**ترش**: سماق. (ژەن.، باک.) سڤۆک. تورش. بەری دارێكییـە بـە هێشـو دەیگرێ و وەكوو نیسكی وایە بۆ مزركردنی چێشت و چتی تر دەستدەدات. مـەردومی مۆن و گرژ. ـــ بوون: تورش بـوون. مـۆن و گـرژ بـوون. ـــ كردن: ترشتێكردن تاتـامی ترشی بـدات. مـۆن و گرژكـردن. تـامی تورشی وەكـو تـامی سماقی.

**ترشان**: تورشان، ترشبوونی ماست و چێشت و چتی تر بـەهۆی كۆنبوون و زۆر مانـەوەی. بـۆ كەسـێكیش بـەكاردەبرێ، كـە زۆر نوسـتبێ دەڵێـن فیسـارەكەس هێنـدە نوستووە ترشاوە واتـە پەندەمووسـی كـردووە. ـــ ی هەویر: هەڵپرووكان، هەویر هەڵاتن.

**ترشاندن**: تورشاندن. (باک.) خلسكاندن.

**ترشاو**: تورشاو، ترشەڵۆک. مزرۆکە (چێشت). زۆر نوستوو. ئاوێکە لەکانی زەوی دەردێت ترش و بۆن ناخۆش بۆ نەخۆشی پێست (خارشت) زۆر باشە. گراو، گەراو.

**ترشە**: مزرە، مەیخۆش. نێوی کچانیشە.

**ترشەڵۆک**: ترشاو، چتی ترشاو و ناخۆش.

**ترشەڵووک**: ترشەڵۆک.

**ترشنە** (هەورا.، ئەردە.): تەشوێ، تیشە.

**ترشنەی گڵکاری**: پاچ، تەشوێی قورەکاری.

**ترشقە**: تریشقە.

**ترشک** (باد.، باک.، بار.): کفتە و شۆرباوی ترش، چێشتی کفتەی گەورە و گچکەیە لاسکی سلق و چەوەندەر و ئاوی ترشی تێدەکرێ، بە هەموو جوورە خواردەمەنییێکی ترش دەڵێن، کە شل بێ.

**ترشکە**: ترشۆکە.

**ترشکێن**: بەخۆداشکێنەوە، تەریق کەرەوە. تەریق بووەوە، شەرمەسار. ـــ بوون: تەریق بوونەوە، شەرمەساربوونەوە.

**ترشکێن کردن**: تەریق کردنەوە، شەرمەزارکردن.

**ترشکێنی**: شەرمەزاری، شەرمەساری.*

**ترشۆ** (باک.): ترشۆکە.

**ترش و تاڵ**: چێشت و خواردەمەنی زۆر ناخۆش. مرۆی گرژ، مۆن.

**ترش وتەلاش** (بابا.) چێشتێکە بە نیسک و برنج و چەوەندەر دروستەکرێت، چەوەندەر بە ترش.

**ترش و شیرین**: جووره شیرنیاتێکە. چتی مەیخۆش، مزر. شەربەتێکیشە لە دۆشاو و ترشی سماقی دروستەکرێ.

**ترشۆک** (زا.): ترشۆکە.

**ترشۆکە**: ترشۆ، تورشکە. (ڕۆژ.) گولووکە. گیایەکی ترشە و دەخورێ و چەند جووری هەیە: ترشۆکە، ترشۆ، ترشۆک. ترشۆکەگایانە. ترشۆکە پەلک بەدراوە.

**ترشی**: ترشیات،(باد.) ترشاهی. تامی ترش وەکوو تامی قۆرەی. لەپە برنجێکە ــ تێکرابێ.

**ترشیات**: ترشی، جووره ترشییەکە لە سرکە و سەوزەواتی چنراو دەگیرێتەوە.

**ترشین**: ترشان. (باک.) هەڵخلیسکان. بترشە: هەڵ بخلیسکێ.*

**ترشینە** (هەورا.): سرکە.

**ترغەل** (باد.): شلەپەتە.

**ترفاڵ** (ئەردە.): تلتە، تلپەی چت، تلفار. تلف، سلف.

**ترفە** (کە.): دەنگی شکانی دارییە. تریە.

**ترقە**: هەڵوورژە سیقەتورەیی.

**ترک**: ناوی نەتەوەیەکە لە چینێوە تا سنووری یۆنان و بولغارستان کشاوە، هێندێکیان لە لای ڕۆژهەلاتی یەکێتی سۆڤیەتی (جاران)* دا دەژین تەنها نەتەوەی کورد لەناو ترکی ئازەربایجان و ترکی تورکیادا دەژی. بۆیە ترکی تووراتی (کەمالی) وایان بڕیاردابوو، کە بەزۆر کوردی بکەنە تورک هەتاکوو تورکستانێکی مەزنی لێ دەرخەن، بەلام لە سەدەی بیستەمدا ئەو داخوازییە پێک نایەت چوونکوو نەتەوەی کورد ووشیار بۆتەوە لەژێر کابووسی بێ ئاگایی خەوی گران ڕاپەڕیوە. (باک.) دەنگی شکانییە، قرچەی شکانێ. تەرزەڵووکە، تەرزەی گچکە.

**ترکانی**: جووره سەمایەکە لەگەل جوولاندنی ئەندامانەدا.

**ترکەر**: ترکەن، ترن.

**ترکەرەشە**: ترک، تورک.

**ترکەزاندن** (ڕەوا.): درکاندن، ترەکاندن، ڕاز و نهێنی ئاشکراکردن.

**ترکەش**: تەنیشت.

**ترکەن**: ترن، ترکەر. گیانداریکە زۆر تران بکەنێ.

**ترکەندن**: کەندن، کەنن، ڕاهێشتن، (باک.) ترکرن. ترین، تربەردانەوە.

**ترکزە** (ڕەوا.): هەر چتێکی وەکوو تەپکە و تەڵە بنرێتەوە، کە چتێکی وێ کەوێ دەرچی ــ ی پێدەڵێن.تێرەتی. تەڵەزگە، گێچەڵ، گێژەن.

**ترکک** (باک.): داری چکۆلە.

**ترکۆ** (باک.): لەکاتی بانگ کردن یا ووتووێژدا بە ژنی خۆیان دەڵێن ترکۆ لە جیاتی ئافرەت.

**ترک و خووا** (خۆ.): بەهەڵکەوت، بەرێکەوت.

**ترکی**: زمانی تورکی، ئەزمانی ترکی. (باک.) قەڵشاو.

**ترکین** (باک.): قەڵشین. زریان. شرەقیان.

**ترگار**: (زرا.، بار.)قاپی مس، ئامان، (ڕەوا.) بادی. (خۆ.) بادیلە.

**ترگال**: (زرا.، بار.) ترگار، جام، شووشە، بادی ئاوێ.

**ترگزۆک** (بار.): تەرزە

**ترلەیلێ**: بریتییە لە مەردومی بێ نموودی هیچ و پووچ.

**ترلێدان**: ترکەندن. خۆهەڵکێشان.

**ترماسک** (خۆ.، هەو.، دەر.، کۆ.): زەنگەتە ترێ.

**ترمە** (باک.): پشتێندی ئاوریشم. کەشیدەی حاجیان، (ئەردە.) شاڵی کشمیری.

ترمسک

**ترمسک** (هەو.): گلووە ترێ.

**ترن**: ترکەر، ترکەن. گیانداری بێکارەو هیچ و پووچە.

**ترناچک** (خۆ.): زەنگەتەترێ. (شەق.) کووارگە.

**ترناچکە** (خۆ.): زەنگەتە ترێ.

**ترنسک** (خۆ.، ڕەوا.): زەنگەتە ترێ.

**ترنج**: ترنجۆک وەکوو نارنج و پرتەقاڵییە بە خاوی ناخورێ. میوەی دارێکییە، نارنج. (قەلا.) چەقۆیەکە دەسکی لە شاخی بێ. جووره نەخشێکە لە مافووره و چتی دی دەکرێ.

**ترنجان**: لەناوەوەچوون، چوونە نێو. تێ ــ : چوونەناو، قرسان. گیربوون و چەسپ بوونی چتێک لەناو چتێکیدا.

**ترنجاندن**: بردنە ژوور، تێ ترنجاندن. قرساندن، خرساندن. بەزۆر چتێک بردنە ناو چتێکی ترەوە.

**ترنجانن**: ترنجاندن.

**ترنجە** (باد.): پەیژە، پێپیلکە.

**ترنجەبین:** جوورە شەربەتێکی مزرە وەک ئەسکەنجەبین. ترنجەمین.

**ترنجەمین:** ترنجەبین، خۆشاوێکی خۆش و مزرە وەک ئەسکەنجەبین وایە.

**ترنجۆ:** تیغی بەبڕشت و بڕندەیە.

**ترنجوو:** تیغی بڕندە.

**ترنجۆک:** ترنج، لیمۆ، نارنجۆ، هاڵەپیرێژنانە. گیایەکی گەڵا تووکنە وەکوو گەڵای گوڵەباغە بۆنی وەکوو بۆنی نارنجە دەکرێت بە شۆرباو بۆ خارشت (خورشت) ی پێست زۆر سوودمەندە. گیایەکی گوڵ وورد وسپییە، گەڵایەکانی کەمێک پانە و زەرد و بۆنداره و زۆر بۆ زگ ئێشە دەیکوڵێنن و دەیخۆن گوڵەکانی وورد و سپی و بۆنخۆشن.

**ترنجیان:** ترنجان، گیرکردن، تێ ترنجاندن.

**ترندوو** (شا.) : کری بووزووە کە تەواو ڕایەڵ کرابێ و دووایە کرابێتە گلۆڵە. (سیوە.) تروندوو.

**ترنگ:** (ڕۆژ.) گیراوەیەکە هێندە شل بێ ئاوەکەی لە ماکەکەی پتربێ. چەشنە دەنگێکە وەکو (چنگ، ڕنگ، شنگ، خنگ). تراو. (ئەردە.) پلەو پایەی بەرز، جاه، جایەگا. (ئەردە.) پڵتۆک.

**ترنگان:** ترنگاندن.

**ترنگاندن:** وەترنگەخستن، وەدەنگ هێنانی تیر یا سیمی تار.

**ترنگای ترنگ:** دەنگی بێ پسانەوەی کەوان یا سیمی تار.

**ترنگە:** دەنگێکە وەکوو دەنگی تار و عود. پڵ، پڵتۆک. ـــ ترنگ: ترنگەی یەک لەدووای یەکتری.

**ترنگو هۆڕ:** ترنگەترنگی زۆر. (ئەردە.) پڵتەقاندن.

**ترنووسقاو:** چەوربیەکی کەمە بەسەر شۆربا و گۆشتاوەوە. گۆشتەکە ئەوەندە لەڕە ـــ ی بەسەرەوە نیە.

**ترنیسق** (ئەردە.) : (موک.) زرووقایی، زڕنووقایی. کۆترەباریکە.

**ترۆ:** توورە، بێچیکڵدانە. قەڵس. (باک.) درۆزن، ترکەن. (دەر.، خۆ.) سەرسەری، هیچ و پووچ، خوویڕی، جینگەنە، ئەوباش، لۆتی، بەدناو، پەتیارە، بێشێواز. سوورزمانی، جندە، سەلیتە، ئافرەتی حیز.

**تروان** (دزە.) : چڵدان.

**تروێندن** (هەو.) : چڵدانی برینان.

**ترۆپکە:** (ڕەوا.) تەپۆڵکە، تەپلەسەر. سەر سەرەوەی جێگایەکییە کەمێک بڵند بێ یا زۆر وەکوو تۆقەسەری گرد و چیا و ئیتر.

**ترۆتس:** ترۆفس.

**ترۆتفاق:** ئازووقەی ماڵێ. تفاقی شەڕێ.

**ترۆتۆپ:** (دەر.) بافێش، فیشار. فیشاڵ.

**ترۆتۆپکار:** بافیشکار، بەفیشار. ـــ ی: بافیشکاری. *

**ترۆزڕ:** هەوا و فیزی بێجێ.

**ترۆزی** (باک.، هەو.، هەورا.) : ترێزوو.

**ترووسک:** تروسکە، تریسکە، چرووسکە. گیانداری چالاک. ترسەنۆک. وولاخی ـــ : وولاخێکە بسڵەمێتەوە.

**تروسکان:** (دزە.) تریسکان. پرووکان، پرووکانەوە، تروسکانەوە. چرسان، چرسین. (باک.) پرووسین. کزرین. درەخشان، درەوشا. تەیسان، تەیسین.

**تروسکانەوە:** پروزکانەوە، چرسکانەوە. ڕووناکیدانەوەی چراو ئاگر و برووسکە لە دوورەوە.

**تروسکاندن:** چرساندن، درەوشاندن، کزراندن. ترووکاندنی چاو.

**تروسکانن:** تروسکاندن.

**تروسکایی:** ڕووناکییێکی زۆر کەمە، چاوم بە ئاستەم ـــ دەکا.

**تروسکە:** ترووسکایی. بریقە، پەرداخ، شەبەق، برووسکە، برووکە، بریسکە، تریشقە، چرووسکە، تریسکە، تووزوسکە، (دەر.) چریسکە، گەشی. تەییس. ڕووناکییێکی بێ تینە وەکوو تینی چرایەکی کز یا ئاوێکی زۆر دوور. نێوی ئافرەتانە.

**تروسکەتروسکە:** بریقەبریق.

**ترووسکەدار:** وورشەدار، درەوشەر، پەرداخدار. (باک.) بڕەوش، بەلۆق، هولووس، گەش، شەبەقدار، برووسکەدار، بریسکەدار، چاڤ بەرد.

**ترووسکەداری:** وورشەداری.

**ترووسوکەدان:** (باک.) برووساندن.

**تروسکەر:** ترووسکەدەر.

**تروسکیانەوە:** ترووسکانەوە.

**ترووشکە** (ئەردە.) : ترشۆکە.

**ترووقانن:** ڕەتاندن، تاراندن.

**ترووقە** (ئەردە.) : شکان، ڕاکردن.

**ترووقیان:** ترووقە.

**ترووکان:** قووچان. چاو ـــ : چاو قووچان، چاولێکنران. پرووکان. تۆ ـــ : تۆقرتان، تووکان.

**ترووکان:** قرتانی تۆو چتی وا.

**ترووکاندن:** چاوقووچاندن، چاولێکنان، چاولێکدان، نقاندن. پرکاندن. تۆ ـــ : تۆ قرتاندن، تووکاندن، تووکانن، ناوکی تۆو ئیتر و دان دەرهێنان. دەست بە پەلەپیتکەدانان بەبێ فیشەک. مریشکی کورک بە دندووکی هێلکەکانی دەترووکێنی (دەشکێنی) تا جووجکەی لێ بێتەدەر. (خۆ.) هێلکە هەڵهێنان.

**ترووکایی:** تروسکای.

**ترووکە:** ترووکایی.

**ترۆکردن:** دەرکردنی یەکێک بە سووکی.

**ترۆلاق** (لو.) : ترۆڵ.

**ترۆلە** (باک.) : ماست.

**ترۆڵ** (لو.) : شیاکە.

**ترووم** (ئەردە.) : نەژاد، ڕەسەن.

**ترومپا** (بابا.، جا.) : فیچقە. ئاڵوگۆڕ، هەرەوەز، دەستەوا.

**تروندوو** (سیوە.) : ئاڵوگۆڕکردن. *

**ترهان** (باک.) : پاراوبوون، پاڵێوران. لێوڕێژبوون.

**ترهاندن** (باک.) : پاڵاوتن، پاراوکردن. لێوڕێژکردن. بترهێنە: بپاڵێوە.

**ترهانۆک** (باک.) : پاڵووێنە.

**ترهە** (باک.) : هەڵقورینجراو، گڕاو.

**ترهێو:** لەکاتێکدا بەکاردەبرێ، کە گاڵتە بە کەسێکی بکرێ، کە بە چەشنێکی نارەوا دووابێ یا فەرمانێکی بێ جێی کردبێ.

**تری:** (باک.): ترێ.

ترێ

**ترێ:** (باک.) تری، (هەورا.) هەنگوور، (لو.، فە.) ئەنگوور، بەری درەختی مێوییە و کە بەهێشوو دەیگرێ. ناوی چەشن و جۆرەکانی ترێیان لە شارەزوور و خاکی پاکی بابان‌دا: ئزمیری، بۆڵمازوو، پاشایی. پاییزە، تایفی، چەمیلە، دەرەبۆڵە، ڕەشکە (چەند جۆری هەیە)، زەردکە، زەردێ، زەلکە، زرافی، سالحی، سەعدانی، سپیلکە، سووراو، سوورشامی، شەقشەقە، شمیری، شیرازی، عشاق، فەرخی، کاژاو، کشمیشی، کلکە ڕێوی، گەرمکە، گون توولە، مام برایمە، مێخی، نینۆکی بووک، هیندوویی، یاقووتی. لە باکوور گەلێک جوورە ترێ هەیە بەلاّن مامۆستا جگەرخوێن تەنها ئەم هەشتانەی نووسیوون: مەزرۆنە، گەورە، زەیتی، حەسەنی، بەنگی، سفنک، کۆخەر، کەرکوش.

**تریاک:** (باک.) ئەسرار. تلیاک. شیرەی گوڵەخاشخاشییە بۆ زۆر دەرمانان باشە، بەلاّن بەکێشانی ڕیشەی تەندروستی و تەمەن بەبادەدات.

**تریاکخۆر:** تریاک کێش، کەسێکە هۆگری کێشان، خواردنی تریاک بووبێ. ــ ی: تریاک کێشی.

**تریاک کێش:** تریاکخۆر. ــ ی: تریاکخۆری.

**تریاکی:** تلیاکی، کەسێکە، کە زۆر تریاکی بخوا.

**تریان** (خۆ.): سەوەتەیەکی قووڵە سا گچکە یا ناوونجی بێ، بەهی گەورە دەڵێن: چەرخەتی. قوڵینە، تریانە.

**تریانە** (بار.): تریان، (هەورا.) تەریان. (دەر.) تلیان. شیرەوانە، سەوەتە، سەبەتە. قوڵینە.

**ترێ پاییزە** (موک.): جوورە ترێیەکە. (بابا.) چەمیلە.

**تریت:** تڵیت، تێ کوشین، تیکوشیو. نانێکە، کە گوشرابێتە چتی شلەوە.

**تریت کردن:** تڵیت دروستکردن، تێکوشین.

**ترێچن:** تریکشین. ــ ی: تریکشینی.

**ترێ دۆشاوی:** (موک.) مامبرایمە. جوورە ترێیەکە.

**ترێ ڕەش:** گەودوونە. ــ لە سای گەردنێدا دیارە: واتە گەردەنی ئەوەندە پاک و ڕوون و ڕۆشنە گلووە ترێی، کە قووتدا لە گەردنی لەدیوی دەرەوەدا دەبینرێت.

**ترێ ڕەشکە:** جوورە ترێیەکە.

**ترێ ڕێویلە** (شا.): (بار.) داڵینۆک. ترێیەکی ڕەشی ووردی کێوییە.

**تریز:** (ئەنە.): درز، دەرز، تریک. قەڵەشت، تەرەک.

**ترێزە:** بەو گۆشتە دەرپەڕیوو ئەستوورایییەی پژملی دەڵێن.

**تریزە** (ئەردە.): قوون، کوون، قنگ، سورین.

**ترێزوو:** (هەو.) تەروزی. (باد.) تروزی. (هەورا.) ترۆزی. مەخلیلات. ــ ی ناسک: چەمیلە.

**ترێژ** (باک.): تیشکی هەتاو.

**ترێ سەرقولە:** قەرخە. جوورە ترێیەکە.

**ترێ سپیکە** (بابا.): جوورە ترێیەکە.

**تریسک** (خۆ.، ڕەوا.، گەر.): تیشک، تروسکایی ڕۆژ و ئاو و ئاوور. (ڕەوا.) گلووە ترێ.

**تریسکان:** تروسکان.

**تریسکاندن:** تروسکاندن.

**تریسکە** (دزە.): تروسکەی خۆر لە ڕوچناندا. شەوقی شووشە و گەلێ چتی تر.

**تریسکەتریسک:** تریسکەی یەک لەدووای یەکتری.

**تریسک و هۆڕ:** مۆڕونەوە و گووێ قوتکردنەوەی ئێستر لەکاتێکا، کە بگاتە شیوێک یا کەندەلاّنێک.

**تریسکو هۆڕ:** تریسکە تریسکی زۆر.

**تریسم** (کۆ.): تیلماسک، پارچەی درێژ و باریک.

**تریش:** دیکەش، دیژی.

**ترێشتە** (هەورا.): تەشووێ، تێشە.

**تریشقە** (هەورا.): تروسکە، تریسک، تریشک، برووسکە، چەخماخە. برووسکەی هەوور، کە لە چتێکی بدات.

**تریشک** (باد.): تریشقە، ترووسکە.

**تریشۆنگ** (باک.): قۆندرەی خلیسکێ.

**تریفە:** تەریفە، وورشە، شەبەقی مانگ. ــ ی مانگە شەوێ: شەبەق و تروسکەی مانگە. (هەورا.) دەردێکە لە جەرگ و هەناوی ئاژاڵان دەدا، هەر ئاژاڵێکی تووشی ئازاری وا بووبێ سپیەکەی بەلای وورگییەوە دەنووسێ جوولەکە نایخۆن. دەردێکی دیکەشە لە تێنوێتییەوە یا گەرماوە تووشی ئاژاڵ و وولاّخانبێ، ڕیخۆڵەی ڕەشدەکات و سپیەلاکی بە پەراسوویەوە دەنووسێ.

**تریفەتریف:** تریفەی یەک لەدووای یەکتری.

**تریفەتێکەوتن:** مەبەس لە زۆر تینوو بوونێیە، کە نەخۆشییێکی ئاژاڵانە.

**تریفەی مانگ:** تیشکی مانگ.

**تریقانەوە** (گەرمێن): بەقاقاپێکەنین.

**تریقاندن:** لە قاقای پێکەنین دان.

**تریقە:** قاقا، تریقەی پێکەنین، ترەقە، پریقە، پریکە. ــ ی پێکەنینێ: قاقای پێکەنینێ. دەم بە ــ: دەم تراق، دەم بەقاقا ،زار بە قاقا. (کە.) ناوشان، نێوشان.

**تریقەتریق:** قاقای پێکەنین، تریق و هۆڕ، قاقا. تریقەی یەک لەدووای یەکتری، تریق تریق. پریکوهۆڕ، زەقین، ترەقین.

**تریق و هۆڕ:** تریقەتریقی زۆر.

**ترێ قۆرە** (موک.): جوورە ترێیەکی شینە گلووشی لە هی کشمیشی ووردترە و دەنکی نیە.

**تریک** (ئەنە.، خۆ.): درز، تریز. هی شاخ و چیا و دیواران، کە زۆر کۆن بێ و هێندەش گەورە بێ چتی تێوەچێ.

**تریکاندن:** قیژاندن.

**تریکە** (کە.): پێکەنینێکی بە شەرمەوەی ئافرەتانە. قیژە.

**تریکشین** (باک.): ترێ چن.

**تری لی لی:** تلیلیلی، تلیلی.

**تریێ مار:** تریێ مارانه.

**تریێ مارانه:** (دەر.) پەسیرە مارانە. گیایەکی وەکوو لاولاوی زۆر بەرز دەبێ و بە داران هەڵدەچێ، بەرەکەشی وە بەلاڵووکی دەچێ، بۆ سووراوی لێو و ڕوومەتانیشی بەکاردەبەن، گەڵای وەپەلکە مێوی دەچێ بەڵان گچکەتر و خڕتره. کە لە ئەژنۆی باداران هەڵبسووێ لەپێشدا خارشتی لێ پەیدا دەکات و لە دووایە فێنک دەبێتەوە، بە ئارەقە چەند تنۆکە ئاوێکی دەردەکات بەوشێوەیە بە چەند جارێکی بنەبڕ دەبێ، کە بنەکەشی ووشک بکرێ و بکوترێ بە برین وەرکرێ گۆشتە زوونەی پێ دێنێتەوە.

**ترین:** بۆ ئەوپەڕی بەسەردابوونە بەدووای ئاوەڵناوەوە دەنووسێ: ئازاد زیرەکترینی کوڕەکانمە، کوردستان ویژەپەروەرترینی کچەکانمە.

**تڕین:** تڕکەندن، کەنن، کەنین، تڕ بەرەلاکردن.

**ترێنه** (بەر.): کۆترەباریکه.

**ترێنکه** (شار.): کۆترەباریکه.

**ترینگه:** چرینگه. دەنگی قاپی ئاسنین و کانانە. دەنگێکە کەمێک لە هی زرنگە نەرمترە. دەنگ و جووره هەست و خوستێکە لەبەر زۆر کەیفخۆشی و شادمانی لە مرۆیان دەبینرێ. — لێ هاتن: ئێگجار کار سازبوون و کەیفخۆشبوون.

**ترینگه ترینگ:** چرینگەچرینگ.

**تریوینک** (دەر.): چڵدان.

**تزبه** (باک.): تەسبیح، تەزبێح.

**تزبوور** (خۆ.): چەشن، جوور، وێنە. وێچوون.

**تزبی** (باک.): تەزبێح، تەسبیح.

**تژه** (باک.): پڕ، تژی، تەژی.

**تژنه** (شەبە.، ڕۆژ.): تینوو.

**تژی** (باک.): پڕ، (باک.) تەژی، تژە. — بوون. — کردن. چالەکە، چووالوو. داعبایەکی کێوییە گۆیا تا لێیدرێ قەڵەو دەبێ.

**تس:** فس، توس، بای نێوزگە، کە بەبێ دەنگی دێتەدەرێ، لە داوێنی پشتەوەدا. — کردن: فس کەندن. — کەندن: فس کەندن.

**تس** (باک.): ووشک، ئیشک، نانی بێ پێخۆر.

**تسان:** تسین.

**تساندن:** فساندن، فس پێکەندن.

**تسەک:** کەووش.

**تسەگورگ:** گیایەکە تۆوەکەی وەهی کونجی دەچی.

**تسدانەوە:** مەبەس لە سەرنەکەوتنی یەکێکییە، کە لە ئەنجامیدا دەستی لێ هەڵگرتبێ.

**تسقل** (ئەردە.): جوورێکە لە بەرەکانی دارمازوو.

**تسقڵەگورگانه:** گیایەکە وەک قارچک ناوەکەی بەتەڕی وەک چرێش و بە ووشکی وەک خەنەوایە، تسلەگورگانە.

**تسکەن:** فسۆس، فسکەن، فسەک، فسکەر، فس، تسۆک، تس. کەسێکە زۆر تسان بکەنێ.

**تسکەندن:** فسکەندن: تس بەردانەوە.

**تسله** (فە.): پەین، تەرسەقوڵ، زبڵی وولاخ وئاژاڵ و ئیتر.

**تسله گورگانه** (هەورا.): تسقڵە گورگانە.

**تسن:** تسۆک، تس خەست، تسکەن. بەمەردومی تەمبەڵ و بێکارەش دەڵێن.

**تسۆک:** تسن.

**تسوێ:** توویێسی، گیایەکە لە شیرەی وی جەوی دەگیرێت.

**تسی** (باک.): ووشک، ئیشک، ئیشکی. نانی — : نانی ووشکی (بێ پێخۆر).

**تسین:** تس کەندن.

**تش:** لەکاتی بێ باوەڕی و قەشمەریدا بەکاردەبرێ. (هەورا.) ترش، تورش.

**تشاو** (هەورا.): مزرۆکه.

**تشه** (باک.): پڕە، تژە، تژییه.

**تشپۆ** (ڕەوا.): تشپۆک، لووی نێوگۆشتییە، کە لەنێو بەز و گۆشتیدایە. (ڕەوا.) زیپکه.

**تشپۆک** (هەورا.، ڕەوا.): تشپۆ. لووی نێوگۆشتی. زیپکه.

**تشت** (باک.، ڕۆژ.): چت، شت.

**تشتانۆک** (باک.): قەوسەلە، مامک، مەتەڵ، مەتەڵۆک.

**تشتەنۆک** (باک.): تشتانۆک.

**تشتوور** (باک.، زەن.): قسر. چووێشتیر، بزنێکە لەوساڵەیدا، کە تەگەی نەگرتبێ، بزنەقسر.

**تشت و مشت:** کەل و پەل. شووێن، ئەنجام.

**تشتیر** (باک.): چووێشتیر.

**تشڵەکەین** (هەورا.): شۆرباوی ترشی.

**تشۆ** (باک.): کوڕڕ ڕ، چۆچۆچۆ. ووشەیەکە کەری پێ بانگ دەکرێ.

**تش و پزین** (هەورا.): ترش و شیرین.

**تشی** (هەورا.): ترشی.

**تشین** (هەورا.): لەپەترشی.

**تغار** (باک.): تەغار.

**تف:** خوزی. (دەر.) خۆریس. (ئەردە.) تفلیک، ئاودەم. ئاوی خەستی نێوزاری و لیکنە، کە فڕێی دەدەن. — کردن: تفاندن، تفین. — لێ کردن: تف پێدادان، مونج لسەرکرن. — کردنەوە: داتفاندن، تفاندنەوە. (موک.) جگێکە لا لووسەکەی بکەوێ دژی میری.

**تفاف** (باک.): ماودای کورت، ماوەی کورت.

**تفاق:** ئالیکی وولاخان، کە ووشک بێ، ئالیکی وولاخ و ئاژاڵانە بەکا و جۆ و گیا و وێنجە و ئیترەوە، کە بۆ زستانێی ئامادەدەکەن. — ی جەنگێ: کەرەستەی شەڕێ. تڕوتفاق. دانەوێڵەی ماڵی، کەرەستەی ناوماڵی. ئازووقە، کەرەستەی جووتی. بەسەلیقە، دەست ڕۆیشتوو، دارا. (ئەردە.) سەوزی، ئەزبیه.

**تفاقی ڕێگه:** تۆشەی ڕێگا.

**تفاقی شەڕێ:** کەرەستەی جەنگێ، تڕوتفاق.

**تفال** (باد.): سفره. پەڕۆیەکیشە بەسەر هەویری دادەدرێ.

**تفاندن:** تف کردن.

**تفاندنە دەم یەکتری:** مەبەس لە دووکەسە یا پتر، کە لە قسەیەکدا یەکدیگرین.

**تفانەناودەم:** مەبەس لە وانە دادانی یەکێکیە، منداڵەکانی نەریان هەموو دایکیان تفاندوویەتە ناو دەمیانەوە، واتە فێری ئاکاری خۆی کردوون.

**تفاندنەوە:** تفکردنەوە، داتفاندن، فڕێدانی خواردەمەنی ناو دەمە لەگەڵ تفی لەبەر هەر چتێکی بێ.

**تفاندنەدەم یەک:** یەکدیگرتن، پاڵ بەیەکەوەدان.

**تفاننەوە:** تفاندنەوە، تفکردنەوە.

**تفە** (هەورا.): مۆرە، قوڕەپەست. دیوارێکە تەنها بەقوڕ دروستکرێ.

**تفەدەست** (ڕەوا.): دەست بەتفی تەڕکردن بۆ دار شکاندنێ.

**تفەڕەوەنی** (هەورا.): تووشامی، تووی سوور، گاتوو، (هەورا.) تفە سووری. شاتوو.

**تفەزرێ:** تووڕەمەکی، تووکێوی.

**تفەک:** تفەنگ.

**تفەنگ** (فە.): چەک. ـــ لیت: تفنگی کەپۆ. (باد.) تفنگ. جوورە چەکێکی ئاشکراو دیار و ناسراوە. ـــ ئاوێژتن: تەقە بە تفەنگ کردن، تفەنگ تەقاندن.

**تفەنگاوێژ:** بە تفەنگی تەقەکار (تەقەکەر)، تفەنگ تەقێن. ماوەی هاوێژتنی گوللەیە بە تفەنگ. لێرەوە تا باداوە ـــ یکە.

تفەنگاوێژ

**تفەنگ تەقێن:** تفەنگ ئاوێژ.

**تفەنگ چاک کەرەوە:** (باد.) جەخسی.

**تفەنگچی:** تفنگچی، تەنگێو، تەنگێوە. نیشانچی. کەسێکە زۆر جاران نیشانە بنگێوێ.

**تفەنگچێتی:** بڕوانە: تفەنگچی.

**تفەنگساز:** (باد.) جەخسی. کەسێکە تفەنگی دروست بکات.

**تفەنگسازی:** تفەنگ دروستکردن.

**تفەنگی ڕاوێ:** ئەو تفەنگەی کە ڕاوی پێدەکرێ.

**تفت:** تامێکە لەنێوانی تاڵی و ترشیدا وەک تامی مازووی هاڕراو. (باک.) کوڵک، تووکی ووشترێ.

**تفتی:** (با.) دانوولە. بوونی چت بەتفت، تفتایەتی.

**تفتیک:** (موک.) گەندەتووک. تووکێکی وورد و نەرمە لە بنەوەی تووکە درێژەکەی ئاژاڵاندایە، بۆ دروستکردنی لبادی باش و سیدارە و چتی ناسک بەکاردەبرێ. (موک.) کوڵک. (هەورا.) کورک.

**تفتیلک** (هەو.، خۆ.، شەم.): تڤیرک. کۆترەباریکە.

**تفە** (ڕەوا.): تێکوڵی دارانە، (هەورا.) تۆکڵ. تفل.

**تفرەمار** (کۆ.): کراسەمارانە.

**تفرەوەن** (هەورا.): شاتوو، تووسوورە.

**تفک** (باد.): (ئەردە.) کوورەی دەمانێ. سێکوچکەی ژێر مەنجەڵ. (باک.) ئاگردان، ئاوررگ. لەڕووی ئەوەوەکە هەموو کەسێک تفی لەناو ئاگردانی کردووە بۆیە ناونراوە بە تفک.

**تفکە** (ڕەوا.): ئاوورگێکە بەقوڕلەسەر زەوی دروستکرابێ. کووانی (دەر.). (هەورا.) کووانوو.

**تفکردن:** ڕۆکردنی تف.

**تفکردنەوە:** تف فڕێدانی زۆرلەبەرچتی ناخۆش.

**تفل** (ڕەوا.): تووێژ، تێکوڵ.

**تفلێکردن:** تفکردن لەیەکێک لەسەرچتێکی خراپ.

**تفلیک** (ئەرد.): ناوی زار، تف.

**تفنک:** (باد) خنخنک، (فە.) مفگە، ماک، (هەورا.) ووڵەولووتێ. خمخم، فرنک. قوولبێڤل، (دەر.) کونالووت. کونی کەپۆ، جووتەکونەکانی لووت.

**تفنگ** (باک.، بوتا.) تفەنگ. جێ، جێگا.

تفنگ

**تفنگچی:** تفەنگچی.

**تفوو:** تف لێ کردن، مونج، تفکردن، ناوی زارفڕێدان. تفوویێ لەتۆسەدهەزاران تفوو، نەفرەت.

**تفووکردن:** تف لێکردن، بێز و بۆلێکردن. لەعنەت کردن، نەفرەت کردن.

**تفی:** (هەورا.) توو، تووت. تووی دارە توویە، بەری دارە توویە. (باک.) تفوو.

**تفیریک** (باک.): گوویزەبانە.

**تفین:** تف کردن.

**تفینەوە:** تفکردنەوە.

**تڤ** (باک.): دەنگ و ویزەی گوللەیە.

**تڤو** (باک.): توور.

**تڤسک** (باد.): تەووسکە، ڕژک. هەنجیرە کێویلە.

**تڤلک** (باک.): باڵندەیەکە. (باک.) تڤیرک.

**تڤی** (باک.): یار، دۆست. تەنها بۆ نافرەت بەکاردەبرێ.

**تڤێ** (باک.): پێویستە، گەرەکە.

**تڤیرک** (باک.): (باک.) تڤلک. باڵندەیەکە.

**تڤیل** (باک.): باڵندەیەکە وەکۆتری دەچێ.

**تڤیلک** (باد.): پۆڕ.

**تق** (باک.): پێکەنین و قاقایە.

**تک:** بڕیتییە لە ئەندازەیەکی کەم لە چت. چک، پت، نەخت، تۆز. تکێ واتە چکێ، پتێ، نەختێ، تۆزێ. (خۆ.) ئارام، هێدی، هێوور، هێمن. ـــ دان: ئارام و هێدی بوون، ڕاوەستان. لەبزۆزی. (فە.) نوختە، نتک، تنۆک، دڵۆپە، تنۆلە. دوو: هەرتک چاوم: هەردووک چاوم.

**تک مەمک** (فە.): گۆی مەمک.

**تکا:** (باک.) بەرگەر، مەهدەر، لاڤا. هیوی، هیڤی، هێڤی. (جز.، بۆتا.) تۆقە. هیوا، خوایشت، هەویا. ڕوونان لەیەکێک بۆ چتێکی. ـــ کردن: پاڕانەوە، هیواکردن، بەرگەرین، لالانەوە. (باک.) چکا. سا، دەسا، جا، دەجا.

**تکاکار:** تکاکەر، هیوادار، هەویادار، خوایشمەند، مەهدەرڤان. ـــ ی: هیواداری. مەهدەرڤانی.

**تکاکردن:** ڕوولێنان، هیواکردن، پاڕانەوە.

**تکان** (ڕەوا.): دووکان. چۆڕان، چکان. تک تک هاتنە خووار. (باک.) بێزیان.

**تکاندن:** چۆڕاندن. شلەمەنێک بە دڵۆپ دڵۆپ کردنە ناو چتێکی.

**تکاندنەوە:** چۆڕاندنەوە.

**تکانن:** تکاندن.

**تکاو:** چۆڕاو، چکاو.

**تکاوەوە:** چۆڕاوەوە، چکاوەوە.

**تکە:** (هەورا.، باک.) دڵۆپە، تنۆکە. (ڕۆژ.، کە.) مات. ئەو قوولکە و چاڵەگچکانەیە، کە بۆ مەرمەڕێنێ دروستدەکرێت. (ئەردە.) دڵۆپە، تنۆکە.

**تکەتک:** چۆڕەچۆڕ، چکەچک، دڵۆپە دڵۆپ.

**تکەکردن:** دڵۆپەکردن.

**تکباران:** تنۆکەی بارانە.

**تکباڵ** (فە.): سەرەقۆڵ.

**تک تک:** چک چک، دەنگی تکانی ئاوێیە.

**تکتک** (باک.): تەق و هۆڕی چەکانە، قڵپ وهۆڕی چەکانە، دەنگی خرمەخرمی مەترالیۆزێیە.

**تکتکاندن** (باک.): دندووک لێدان.

**تکدان** (ڕەوا.): داکاسان.

**تکدە** (ڕەوا.): داکاسیێ، دامرکیێ.

**تک گووس** (فە.): بەڵگەی گوویێ.

**تکێن:** تنۆکار، تنۆکەژمێر، چپ بۆڕی (قەتتارەی دەرمانی چاوان).

**تگە** (هەورا.): تەگە، سابرێن، نێری، حەچە. ئارەزووکردنی بزنە بۆ نێری. بزنەکە هاتۆتە ـــ: بەتەگەیە. ـــ گرتن: تەگەگرتن.

**تگەر** (فە.): تەرزە.

**تگەگرتن:** جووت بوونی بزنە لەگەڵ نێری.

**تگر** (فە.): تەرزە. (ئەردە.) تەزرە.

**تگڵ:** قۆچ، بەران، شەکەنێری چوارساڵە.

**تل:** (هەورا.، ڕۆژ.) پشکەڵی ئاژاڵی وورەیە، کە زستانان تەڕە، بەشیاکەش دەڵێن. (هەورا.، زەن.) جاڵە، گاشەبەرد، تاوێرەبەرد. (هەورا. کۆن) چڵ (چڵی گیا و ئیتر). تولە، سەگی تولە، تلە. چتی هەڵبژاردە، چتی بێهاوتا. (ڕەوا.) کۆڵ، تێلە. (ئەردە.) چڵ، برووسک، تلەتل (سۆی برینان). (خۆ.، زاخ.، باد.) قامک، تپل. (باد.، سوو.) زگ، سک، وورگ. ـــ دار: ئاووس، زگپڕ. خل، تلۆر، خلۆر، گل، پل، تلێر، خلیر. تل دان: خولخواردن، چنگلدان. ـــ بوونەوە: خلۆربوونەوە، خل بوونەوە. (هەورا.) ـــ کەردە بۆ: خلۆرکردنەوە. (باک.) سەکۆ، گرد، تەل، تەپۆلکە. کەمێلە.

**تلا** (لو.): تەلا.

**تلار** (باک.): تەمبەڵ.

**تلان** (ئەردە.): گلان، تلخواردن، تلدان، تلانەوە، تلیران، گلێران، خلان، خلێران.

**تلانەوە** (کە.): تلینەوە، گەوزین، گلانەوە، تلخواردنەوەی گیاندار لە پاڵەوە.

**تلاننەوە:** تلانەوە.

**تلاندنەوە:** گەوزاندنەوە، گەوزاندن، گلاندنەوە.

**تلانن:** تلاندن، گلاندن، پلانن، پلاننەوە، تلێرەوکردن، خلێرەوکردن. پلانن، پلکانن، ناوین، تێکەڵ کردن، تێوەدان.

**تلاوتل:** تلبوونەوەی چتێک لە لێژاییێکەوە. گلورگل، خلەخل، خرتەخرت.

**تلاوتل کردن:** خلۆرکردنەوە، تلۆرکردنەوە.

**تلّە** (ئەردە.): نێڵەی ئاووریە، بڵێسە. چڵ، برووسک و ئێش و ئۆفی برینانە.

**تلە:** (ئەردە.) دون، لەسەر تەپۆلکە وەستاو. وێستانی بەرد لە هەوراز و لێژێکیدا بە چەشنێکی وا، کە کەمێک تەکانی پێ بدرێت: خلۆربێتەوە. مرازێکە لەژێر گاشەبەردان دادەنرێ تا خلۆری کاتەوە. بن تل.

**تلّەتلّ** (ئەردە.): نێڵەنێڵ. چلّەچلّی برینان، برووسک. تەووژمی برینان.

**تلەوبوون:** بەربوونەوە. خلۆربوونەوە.

**تلەوکردن:** بەردانەوە، خلۆرکردنەوە.

**تلبژێن** (ئەردە.): هەڵبژاردن.

**تل بوونەوە:** خلۆربوونەوە، تلۆربوونەوە، خل بوونەوەی چتێک لە بەرزاییەکەوە.

**تلّپ** (دەر.، ڕۆژ.): تلّتە، ترپ، (دزە.) تلّپاس، ترپاس. ترێ و میوەی کوشراو، تلّپە.

**تلپ** (باک.): توور، ترپ.

**تلّپاس** (دزە.): تلّتەی ترێ و میوە و چتی تری کوشراو.

**تلّپە** (ڕۆژ.): تەپە، دەنگی کەوتنە خووارەوەی مرۆڤ و چتی ترە. تێکوڵ و تفر و تلّتەی ئەو میوە و تەماتە و چتانەیە کە ئاویان گیرابێ.

**تلپەتلپ:** تەپەتەپ.

**تلت** (باک.): بەرداشی ئاشی.

**تلتای** (هەورا.): خل بوونەوە.

**تلّتە:** (دزە.) تلپاس، ترپاس، سەرپاتە. (زەن.) سلپەک. (خۆ.) سلّپات، سرپات. (دەر.) ملّت، تلّپ. (ڕۆژ.) تلّف، تلّپ. خشت و خاڵ. پاشماوەی میوە و چتی جوواو و مژراو یا کوتراو و کوشراو.

**تلخواردن:** تل بوونەوە، خلۆربوونەوە.

**تلدار:** ئاووس، زگپڕ، تۆنپڕ، تۆلدار.

**تلداری:** ئاووسی، زگپڕی.

**تلدان:** پاڵ بە چەشنێک، بەچتێکەوەنان، کە تل بخووا. زگدان، بەرد یا خشتەکە لە دیواری بۆلای دەرەوە کەمێک یا زۆر دەرکەوتبێ. ـــ ی برین: برووسکدان، پلدان. (فە.) وورک.

**تلسم** (باک.): تەلەسم.

**تلّف** (ئەردە.، ڕۆژ.): تلّتە، تلّفە، تلّفار، سلّف.

**تلّفار** (ئەردە.): تلّفە، ترفاڵ، تلّف، سلّف.

**تلّف زەیتوون:** تلّتەی زەیتوونی.

**تلّف کونجی:** تلّتەی کونجی.

**تلّف هنگوور:** تلّتەی ترێ.

**تلّفە** (ئەردە.): تلّپە.

**تلّقە** (ئەردە.): شلّقەی مەشکە و کوندەی ئاو و چتی تر.

**تلّقەتلّق:** تلّقەی یەک لە دوای یەکتری. شلّقەشلّق.

**تلک:** (ڕەوا.) سەری قامک، دەلّێن ـــ یکی لە ڕۆن یا لە دۆشاویدا: قامکی لێدا. (باک.) قامک. ناوکی درێژ وەکوو هی خورما. تیلماسکێکە لە ترێ.

**تلکەلەرخ:** شارێکی گچکەیە لە نێوانی شارەکانی حومس و لازقییە دا دەلّێن دەهەزار کوردی تێدایە.

**تلکردنەوە:** خلۆرکردنەوەی چتێک لە لێژی و هەورازێکیەوە.

**تلم** (باک.): لە تەل گچکەتر، گردۆلکە.

**تلماسک** (دەر.): زەنگەتە.

**تلمیسک** (دزە.): زەنگەتەی ترێ. گوارە.

**تلنایۆ** (هەورا.): تلاندنەوە.

**تلنگی** (باک.): بەجێ هێشتراو، وازلێ هێنراو.

**تلوتل:** تلاو تل.

**تلۆ:** ناوی گوندێکیە لە خاکی پاکی بۆتانێدا، خەلّکی وێ هەموویان سوننەتی مندالان دەکەن و هەرچەندە هەمووشیان کوردن خۆیان کردۆتە سەییدو بە کوردستانی عێراق و سووریەشدا دەگەڕێن، سولتان مەمدوح پەرتووکی زیلی لەسەر شەرەفنامەی چاکردووە.

**تلۆتەک** (باک.): هێشوو.

**تل وتل**(باد): زگا و زگ؛ ـــ بەزەوریدا کەوت. ـــ خۆی لە ئاوێ ئاوێژت.

**تلۆتیزک** (باک.): بارووتخانە، کارگە و ئەنباری بارووتی.

**تلّووخ** (باد.): ژنی کاولیی بێشەرم. چتێکی تایبەتییە سەهۆلّ وبەفری تێدەخرێ و دەیگوێزنەوە، وەکوو سەوەتەی چەرمی.

**تلوخووێ:** چتی زۆر سوێر.

**تلۆر:** خول، خلۆر. ـــ بوونەوە: خلۆر بوونەوە، قوونەو ـــ: تلووربوونەوە، قنگە و تلووربوونەوە.

**تلۆربوونەوە:** خلۆربوونەوە، گلۆربوونەوەی چتێک لە هەورازێکەوە.

**تلوورکەفتن:** قوونە و تلوورکەوتن، دوولوور، دوولوورە، پالّکەوتن.

**تلۆقە** (باد.): هێشوو.

**تلۆق:** بلۆق.

**تلۆل** (باد.): قوورولیتە.

**تلۆلۆک** (باد.): هەلّوایەکە بەشەکری و ئاردی برنجی دروستکرابێ.

**تلوونج** (باک.): بەستران لەسەرمان، بوونە سەهۆلّ.

**تلهە** (باک.): قامک.

**تلێ:** ناوی گوندێکییە لە خاکی پاکی بۆتانێدا. لەلایەن دروستکردنی کری شالّ و شەپکانەوە بەناوبانگە.

**تلی:** (شەق.، خۆ.) گلووە ترێ. (باک.) قامک. قامکی گەورە دوو گرێی هەیە بەلّان ئەوانیتر هەر یەکەی سێ گرێیان هەیە.

**تلیابەرانکێ:** (ئەمە.، باد.، شکا.) تلیابەرانێ. (باک.) تلیاگردی، تلیاگزری، تلیابەرانەکێ.

**تلیادەستۆکێ:** تلیا هلاڤێژک. دۆشاومژە، قامکی شادەیە.

**تلیاناڤین:** تلیا ناڤچار. ئەرنەموتە، هی نێوەڕاستییە.

**تلیابەرکلیچک:** تلیابابلیچک، براتووتەلّەیە.

**تلیاقلیچک:** تلیا قەرقووچک. تلیابا. قامکە تووتەلّەیە.

**تلیاک** (هەورا.): ترپاک. شیرەی گولّی خەشخاشییە، کە خۆشکرێ بۆ دەرمانی گەلێ دەردو نەخۆشیان باشە.

**تلیاکخۆر:** تریاکخۆر. ـــ ی: تریاکخۆری.

**تلیاکی:** کەسێکە زۆر تریاک بخواو بکێشێ. تریاکی.

**تلیاگ** (ئەردە.): کەسێکە یا چتێکە، کە گلابێ و خلۆربوویێتەوە. پلیاگ، پلکیاگ، تێوەچوو، تێکەلاّو.

**تلیان:** پلیان، پلکیان، تێوەچوون. تێکەلّ بوون. (دەر.) تریان، قولّینە لە شوولّ (توولّ) دروستدەکرێ. گلیان، گلەوبوون، تلەوبوون، خلۆربوونەوە.

**تلّیان:** تلین.

**تلیانە:** تلیانی، قولّینە.

**تلیایۆ** (هەورا.): تلانەوە.

**تلّیت:** تریت، تێکوشیو.

**تلّیر:** تلۆر، گلێر، حلێر.

**تلّیران:** تلۆربوونەوە، تلان.

**تلیرەوبوون:** خلۆربوونەوە، خلیرەوبوون. گلەوبوون.

**تلّیربوون:** گلۆربوون.

**تلّیربوونەوە:** گلۆربوونەوە.

**تلّیس:** تەڕ، خووساو، خووسیاگ.

**تلّیسان:** تلّیسانەوە، خووسان.

**تلّیسانەوە:** خووسان، تەڕبوونەوە.

**تلّیساندن:** تلّیساندنەوە، خووساندن.

**تلّیسانن:** تلّیساندن.

**تلّیسانەوە:** تەڕبوونەوە، خووسانەوە. خووسانەوەی هێندێ چت بەهۆی تەڕبوونیەوە. مردنی کەسێک.

**تلّیساننەوە:** تلّیساندنەوە، خووساندنەوە.

**تلّیساو:** خووساو.

**تلّیساوە:** خووساوە.

**تلّیسک** (هەو.): زەنگەتەترێ.

**تلّیسیاگ:** تەڕ، خووساو.

**تلّیسیان:** تەڕبوون، خووسان.

**تلّیسیانەوە:** خووسانەوە.

**تلّیش:** پارچە، تیتۆل، ڕینەدۆلّ، درز، (هەورا.) نێوانی سەرەتیژەکانی تیشەیە. قلّیش، درز، چاک، ترک، دڕاو، دڕیاگ، هالّ.

**تلّیشان:** داتلّیشان، قەلّشان، قلّیشان. درزبردن.

**تلّیشاندن:** داتلّیشاندن، دراندن، درین. قەلّشاندن، قلّیشاندن.

**تلّیشانن:** تلّیشاندن، درین، دراندن.

**تلّیشاو:** دراو.

**تلّیشبردن:** تلّیش تیّ بوونی چتیّک.

**تلّیش تلّیش:** پارچەپارچە، تیتۆلّ تیتۆلّ، ریندۆلّ ریندۆلّ. ــ بوون: ریندۆلّ ریندۆلّ بوون.

**تلّیشیان** (ئەردە.): قلّیشان، دران، دریان.

**تلیقانەوە** (کە.): فلیقانەوە، تولّخانەوە.

**تلیقاندن** (کە.): فلیقاندن.

**تلیقاندنەوە** (کە.): فلیقاندنەوە.

**تلیقانن** (ئەردە.): فلیقاندنەوە. (ئەردە.) شلیقانن. تولّیخاندنەوە(تریّ و چتی وا).

**تلیقانیّ** (کە.): قەلاّندۆش.

**تلیقیاگ:** شلیقیاگ، فلیقاو(تریّ).

**تلیقیاگەوە** (ئەردە.): تولّخاوەوە، فلیقاوەوە.

**تلیقیان** (ئەردە.): شلیقیان، فلیقانەوە، تولّخانەوە.

**تلیقیانەوە** (ئەردە.): تولّخانەوە، فلیقانەوە.

**تلیک** (یەز.): قامک.

**تلیکە** (باک.): گەمەیەکی کوردییە.

**تلیلاندن** (باک.): بەقامکی دەنگ لە لیّوانەوەهیّنان. تلیلیلی کردن. بتلیلێنە.

**تلیلی:** (باک.) تریلی لی، تلیلاندن. (باد.) تلیلی لی. هەلهەلە.

**تلیلی لی:** تریلی لی، هەلهەلە لیّدان لە خۆشی و شاییدا.

**تلّین** (ئەردە.): هیّشتن، بەجیّ هیّشتن، خستنە پشت گویّ. دووچاربوون.

**تلی نقیس:** تایپ رایتر.

**تم** (باک.): هەمیشە، بیّ برانەوە، تم و تم، پەیتاپەیتا.

**تما:** تەماحکار.

**تماشا:** تەماشا، سەرنج. بروانە، بروا، بنواو، بنوارە، ووردەوبە.

**تماشاکردن:** تەماشاکردن، ووردبوونەوە، ووردەوەبوون، سەرنجدان، دیین، دیتن، نۆرین، روانین.

**تماق** (هەورا.): تاسی ئاو خواردنەوە.

**تماندن:** نەواندنی چتیّک. سەری خۆی تماند: واتە سەری نەواند.

**تمو** (رۆژ.): هەلاّمەت.

**تمەز** (هەورا.): تومەز، تۆمەلّیّ، توومەز.

**تمەن:** بریّتییە لە دە قرانی ئیّرانی.

**تمبک** (باد.): تەپلّ.

**تمتمە:** بزماری مەرزەقانە.

**تمتیّل** (باک.): شیّوەی رۆیشتن. سەرمایە. بالاّ، بەژن.

**تم تم** (باک.): بەستەییّکی کرمانجییە.

**تم وتم** (باک.): هەمیشە، پەیدەرپەی، پەیتاپەیتا.

**تمی** (باک.): هەمیشە، بیّپسانەوە.

**تن:** توند. (ئەردە.) قوون، کوون، قنگ. (موک.) گەلیّک جار بۆ کەسی تاکی سیّیەم بەدووای ووشانەوە دەنووسیّ: دەلّیّتن،دەچیّتن، دەخوواتن، دەنووسیّتن (هتد).

**تناز** (باک.): شۆخی، گەپ، نازکردن. ــ پیّکردن: شۆخی پیّکردن، گەپ پیّدان، قەشمەری.

**تناوور** (باک.): گیاندار، زیندوو، گیان لەبەر. ــ ی: گیانداری، زیندوویی.

**تنە:** گەلەووتە، رستە. (ئیّ.، باد.) نییە، تننە، تونە، توننە.

**تننە** (باد.): نییە، تونە، توننە.

**تنەتی** (باک.): تەنهایی، تنەیی.

**تنەیی** (باک.): تەنهایی، تنەی.

**تنج** (رەوا.): پەکخستن، لەقە لەکاردان. تەگەرەدان.

**تند** (باک.): توند، سەخت.

**تنراو:** چنراو.

**تنک** (فە.): تەنک، کەناری رووبار و دەریان.

**تنگ** (باک.): سلەگوو، تەپەگوو، کۆمای پیسایی.

**تنگە** (هەو.): نیّوی ئافرەتانە.

**تنگەتنگ** (باک.): تەقەتەقی ئاشی و ئیدیکەیە.

**تنگر** (هەو.): نیّوی ئافرەتانە.

**تنگیلّە:** کوندە یا مەشکەی پر لەئاو یا دۆ.

**تنگیلّکە:** کوندە و مەشکەیە، کە زۆر پرکرابیّ لەئاو یا لەچتی تر. گیانداریّکە لەبەر زۆر خواردن ــ بووبیّ. خۆی ــ داوە.

**تن و تۆلّ** (هەورا.): توندوتۆلّ.

**تن و تیژ** (هەورا.): توندوتیژ.

**تنووک:** تاریک بەلاّن بەتەنها بەکارنابریّت، بەلّکوو دەلّیّن: تاریک و تنووک.

**تنۆکار:** چپ بۆری، تنۆکەژمیّر، تنۆک ژمار، تکیّن.

**تنۆکە:** (زەن.) تکە. (باک.) پژاک، چپ. زەنگولّ. دلّۆپەی ئاو و بارانە و شلەمەنییە. ــ ی گچکە: چپک.

**تنۆکەتنۆک:** (باک.) چپ چپ. زەنگولّ زەنگولّ.

**تنیّ** (باک.): تەنها، تەنیّ، تەنیا. بە ــ : بتنیّ، بەتەنیّ.

**تۆ** (باک.): تۆتۆ، تۆ، توی. بۆ سەخلّەتی و زویری بەکاردەبریّت. ئەتۆ، تو، ئەتوو. (هەورا. کۆن) تەوە. (باد.، باک.) تە، ئەو تاکە کەسەیە، کە وتوویّژی لەگەلّ دەکەی. (باک.) تویّ، سەرتوویّ، قەیماغ. (هەورا.) تۆو، تۆم، تۆمە. (باک.) توخم، تۆخم، تۆڤ. توو. ــ ی خواردنیّ یا چاندنیّی دەغلّ و میوە و تەرەکاری. ــ چاندن: تۆڤ ئاڤیّتن، تۆڤ وەشاندن. (موک.) تۆخم، مەنی، ئاو، تەنها بۆ کوران دەبیّ. ــ تکان: ئاورژان. ــ تکاندن: ئاوڕژاندن. چتیّکی خۆش ببینیّ و بەشی نەدریّ: تۆوی دەتکیّ واتا منداڵی نابیّ. (بابا.) تامەتامەکردن.

**تۆبە** (ئارەوییە): پەشیمانی، پاشگەزی، پژمانی، گەرانەوە.

**تۆبەرتۆ:** تۆتۆ، پەڕپەڕە، تووێتووێ.

**تۆبەکار:** پەشیمان، پاشگەز، پژمان. ـــ ی: پەشیمانی، پاشگەزی، پژمانی.

**تۆبغ** (ڕۆژ.): سەرسمدان، هەڵنگووتنی وولاخە.

**تۆبلێی** (موک.): تۆبێی، ئەتوبێی، ئەتۆبلێی.

**تۆپ:** جوورە چەکێکی گەورەوگران و لوولە درێژە، کە گوللە تۆپی تێ دەنرێ و ئاگردەدرێ گرمەیێکی وای لێدێ وەکوو دەنگی هەوری وایە. ـــ ئاگردان: تۆپ ئاویژتن، ساقوول. کۆ، گرد، خڕ، هنارک. ـــ بوونەوە: کۆبوونەوە. ـــ ی دار: هۆگەگ. تۆپی تۆپە ڕاکردنی، تۆپی تۆپانێ. گۆیەکی گەورە یا گچکەی خڕە لەبەن یا لە جیل (لاستیک) و ئیتر دروستدەکرێ تۆپێنی پێدەکەن و زۆر سووکە. ـــ تفەنگێ: ئەنباری تفەنگێیە، تاڤلوو. تۆپە چیت و پارچە و کالاّی تر، بەشێکی پێچراوەوە و قەدکراوە. (هەو.) دووداری خڕ و درێژن لە کەرستەی جەنجەڕێ دەخرێن. تۆپی چیکەنەو ئیتر. ـــ ی ئاشی: تەمووی ئاشی، دارێکی ئەستووری پەڕەدارە بلۆسکی ئاشی تێهەڵدەکێشرێ بۆ سووڕاندنی بەرداشەکەی سەرەوەی ئاشی. دارێکی درێژە پەڕۆی لەسەرەکەی دەبەستن و کونجی ئاوێی پێ تۆپکەشی دەکەن. تێکڕا: ـــ ی هەرکی ـــ دەچنە کووێستانێ واتە هەمووی تێکڕا دەچن.

تۆپ

**تۆپ ئاووردان:** تۆپ ئاوێژتن، تۆپ ئاگردان. مەبەس لە نابووتیشە.

**تۆپ ئاوێژتن:** نابووت بوون، مایەوسەرمایە یا سامان لەدەست چوون، بارام تۆپی ئاڤێتیە.

**تۆپان** (ئەردە.): تۆپ تۆپین. مردنی سەگ و گورگ و جانەوەرانە. لە شێوەی جنێودا بۆ مرۆیانیش بەکاردەبرێت. تۆپێن، تۆپەڕاکردن. تۆپین، مرداربوونی کەر و ئێستر و وولاّخی بەرزە و جانەوەران.

**تۆپاندن:** مراندنی سەگ و گورگ و جانەوەران و ئیتر. لەشێوەی جنێودا بۆ مرۆڤانیش بەکاردەبرێت.

**تۆپانن:** تۆپاندن، کوژتنی سەگ و گورگ و بەراز و کەر و ئیتر. بەناوی سووکایەتی بۆمرۆیانیش بەکاردەبرێ. لێدان.

**تۆپانێ** (هەو.): تۆپێن، تۆپە ڕاکردن.

**تۆپای** (هەورا.): تۆپین.

**تۆپە** (هەورا.): تۆپ.

**تۆپەڕاکردن:** تۆپێن. (هەو.) تۆپ تۆپانێ.

**تۆپەڵ:** تۆپەڵە، هەندێ قوڕ یا گێچ و چتی ترە، کە بەدەست تۆپەڵکرابێ یا بە پێمەڕە هەڵبگیرێ. تۆپەڵەی بەفر یا قوڕ.

**تۆپەڵە:** تۆپەڵ. تۆپێک قوڕ، تۆپێک بەفر، تۆپەڵێک پەڕۆ و ئیدیکە. ـــ بوون: گرمۆڵەبوونی چتێک.

**تۆپەڵەشەڕێ:** شەڕەتۆپەڵ، شەڕە تۆپی بەفر و ئیتر.

**تۆپەوانە:** زارەوانە، گلوورێنە ئاخن. پارچە پەڕۆیەکی تێک پێچراوەوەی خڕکراوەوە لە زاری کووپە و گۆزەلاّن دەنرێ.

**تۆپەتاو** (ئەردە.): تۆپ تۆپین.

**تۆپەتاتۆپانێ:** تۆپەڕاکردن، تۆپین.

**تۆپەتۆپێن:** تۆپەتۆپانێ، یاری کردن بە تۆپ.

**تۆپچی:** ئەو کەسەیە لە تۆپ ئاوێژتن و ئەنگاوتنێدا ڕاهاتبێ. بە مرۆی ترو تۆپکەریش دەڵێن.

**تۆپچێتی:** پیشەی تۆپ ئاوێژتنێ.

**تۆپز:** کوتەکێکی سەر خڕە قیر و بزماری لەسەرەکەی کوتراوە. هێز، تین، زۆر، کەڵەگایی. بە ـــ ی: بەزۆری، بەکەڵەگایی. کوتەکێکی سەرخڕی ئاسنینە، گورز.

**تۆپزی:** زۆرداری، کەڵەگایی.

**تۆپقاڕ:** گەمەی قەلەمندارێیە، تۆپێن.

**تۆپقارێن:** گەمەی قەلەمندارێیە.

**تۆپکەشی:** تۆپدان لە کونجی ئاوی گیراو بۆ کرانەوەی.

**تۆپلاّخ:** کۆسپایی، گڵمەت، گڵمتک، کەرسەک، کەستەک، کڵۆ، کولۆی. گڵی.

**تۆپلاّخە:** تۆپلاخ، تۆپەڵێک لە هەر چتێکی بێ.

**تۆپلاّخەجووچکە:** کۆمەڵێک جوجکە.

**تۆپیگ** (ئەردە.): تۆپیو.

**تۆپین:** مردن، سەکەت بوون. بۆ مردنی سەگ و بەراز و ورچ و کەر و گورگ و هەموو دڕندەیێکی تر بەکاردەبرێ تەنها بۆ مرۆیانیش لە شێوەی جنێودا بەکاردەبرێت. بۆ مرۆی نوستووش لە ڕووی سووکییەوە بەکاردەبرێت، بۆ ئاژاڵ و ڕەشەووڵاخ و گامێشان مندار (مردار) بەکاردەبرێت.

**تۆپێن:** تۆپەڕاکردن، تۆپانێ، هۆلانە. گەمەو یاری بەتۆپ کردن.

**تۆپیو:** تۆپاو، مردار، مندار، مردارەوەبوو. بۆ مرۆی مردوو و نوستووش بەناوی جنێو بەکاردەبرێ.

**تۆت** (باک.): کوند، کوندە بەبوو. ڕۆنشتنا سەرنگێ خووە. لەسەر لنگی خۆی دانیشتن. هەڵتڕووشکان.

**تۆتاک** (ئەردە.): تووێ تووێ، پەڕەپەڕە، پەردەپەردە، توو بەرتوو. (باک.) شایانی بەزەیی. کوند.

**تۆتک** (موک.): چۆک، ئەژنۆ. لەسەر تۆتکان ڕۆنیشتن: لەسەر چۆکان ڕۆنیشتن یا لەسەر لاقان هەڵتڕووشکان و لەسەر قوون هەڵتڕووشکان. (باک.) سەر و کۆفی ژنانە. کوند، کوندە بەبۆ.

**تۆتکە** (ڕۆژ.): ئارامی، هێمنی، سرەوت. ـــ گرتن: ئارام گرتن، داکاسان، ئۆقرەگرتن.

**تۆتکەخوواردن:** سرەوتن، تووێتکەخوواردن.

**تۆتکەگرتن:** ئارام گرتن، تووێتکەگرتن.

**تۆتۆ** (باک.): ناوێکی بێ ناوکە، شووێنێکی نادیارە: بارام د(ـــ) وەدەرکەت، ئەزێ تە د(ـــ)ە دەرخەم.

**تۆتۆیی:** کولێرەیەکە تووێ تووێ پیواز و کاکڵە گوێزی تێکرابێ.

**تۆتی:** (باک.) تووتی. (موک.) دانیشە، زاراوەی منداڵانە. ـــ کردن: دانیشتن.

**تۆتیا:** ڕووح تۆتیا، چتی زۆر وورد.

**تۆچا:** چا، چای ووشک و لێنراو.

**تۆچاندن:** تۆم چاندن.

**تۆچێن:** تۆمچێن.

**تۆخ:** تیر، هەموو ڕەنگێکی تیر، پڕ ڕەنگ. توویخ، تــووێ. (بــاک.) جووره ئالایەکە.

**تۆخم** (باک.، هەو.): تۆو، تۆ، هی خواردن و چاندنێ.

**تۆخۆرکە** (ڕەوا.): جووره باڵندەییێکە.

**تۆدان:** گەرای ماسی و مریشــک و ئیدیکــە. (هــەورا.) گــرا. (بــاک.) تیتک.

**تۆر:** تۆران، ڕق، کین، قین. ـــ ی کردووه: تۆراوه. (بــاک.) هەرێمێکــە لــە ژووررووی شاری (نەسیبین). (تۆرابانی) لەناو هەڤێرکاندایە شەرەفخانی بتلیسی لە مێژووی خۆیدا نــاوی (کــەلا تــۆری) بــردووه، لــە مێــژووی ئــارەواندا(تورعــابدین)ە کێــوی (تورعــابدین) چیــای (هــەڤێرکا) نــە. (بــاجن) و (باجنەخوێر) لــەو چیایــەدان جێگــای خێڵــی (بەجنــەوی) (بەشنەوی)یە. (باک.) تۆرا: بێ خەمی، قەیدی نییە، ئەگەر بارام نــەچیٚ تور ئەز ناچم، واتا قەیدی نییە منیش ناچم چەدەبێ با ببیٚ.

**تۆڕ:** پەردەیەکە بە هۆی چاوێشەوه پەیدادەبێ و بەسەر بیبیلە و ڕەشکێنەی چاودا دەکشێ. ـــ ی ماسیان و باڵندانــە. (هــەکا.) خــەپک. شــەبەک، چتێکە وەکوو ڕەشکەی کــای وایــە ڕاوی ماسی و بــاڵندەی پێدەکــەن. داو، تەڵە، تەشقەڵە، گێچەڵ. نەبان، ســەرکێش، بێگووێ، بارنەبەر، فــەرمان نەبەر، بۆ ئێستر و وولاخی بــەرزه بــەکاردەبرێت. چــەمووش. واژی کــەوی و ڕام. بۆ وولاخی بەرزەبەکاردەبرێ، بەتەوسەوه بۆ مرۆڤانیش بەکاردەبرێ.

**تۆراخ:** (بــاک.) تــۆراق. (مــوک.) ماسـتێکە بــۆ چــەند ڕۆژێکــی لــەناو توورەکــەییێکی دەکرێت و شیووتیشی تێکــەڵاو دەکرێ، هۆی نــاوبرانی بــە تۆراخ ئەوەیە: چونکوو شیوتی تێدەکرێ و لە ڕەواندزیش بە شیوتی دەڵێــن دۆراخ، کــە ئاوەکــەی ڕۆیشــت تــامێکی زۆر خۆشی هەیــە جارجــار دۆشی تێدەکەن تا ئاوەکەی بچۆڕێتەوه. (ئەردە.) هیزه، مەشکە، تەجەره.

**تۆراخدان:** کیسەی تۆراخی.

**تۆراغ:** تۆراخ، تۆراق.

**تۆراغان:** تۆراخدان.

**تۆراغدان:** تۆراخدان، ئەو کیسە یا دەفرەیە، کە تۆراخی تێدایە. شووێنێکە تۆراخی تێدا هەڵدەگیرێ.

**تۆراق:** دۆی کوڵاوه لە کیسەی دەکەن و هەڵی دەواسن، کــە تــەواو ئاوەکــەی چۆڕاوه ـــ ی پێدەڵێن، کەشکیشی لێ دروستدەکەن.

**تۆراک** (باک.): جووره‌پەنیرێکە.

**تــۆران:** زیزبــوون، ڕەنجــان، ســڵ بــوون. (دەر.) تۆریــان. دڵگــیربوون لــە چتێک. دەربەدەر و هەترەبوون.

**تۆرانــدن:** تووڕەوسڵکردن، زیزکــردن. ڕەنجــاندن، دڵگــیرکردن، ڕەمــانن. دەربەدەرکردن.

**تۆرانن:** تۆراندن.

**تۆرانی** (باک.): سەگی تۆراو، تۆر، تۆره.

**تۆراو:** نەبان، تۆریاو، زیز، سڵ، ڕەنجێنراو، ڕەنجانراو.

**تــۆره:** ڕەفتــار، ڕەووشــت، خــوو. شــێواز (ئــەدەب). بــە ـــ: پــەلیار، خووەپیرێزک، بە شــێواز. بــێ ـــ: لا قــردی، لاقرتــێ، کــانج، چارقــاپ، بێشێواز. بیانی، سۆرەوتۆره.

**تۆرەڤان:** وێژەوان (ئەدیب). ـــ ی: وێژەوانی.

**تۆڕەوان:** ڕاوکەرێکە بە تۆڕی ماسی یا باڵندان بگرێت. کەسێکە بە تــۆڕی ماسی و بــاڵندان بگری و ڕاوه ماسی و بــاڵندان بکــات. ـــ ی: بــە تــۆڕی ماسی و باڵندان گرتن، کەسێکیشە پیشەی ماسی یــا بــاڵندە گرتــن بــێ بــە تۆڕی، پیشە و کردەوەی ڕاوه بە تۆڕی.

**تۆربە:** توورەکە، توورێن، توور، توورەکەی کەل و پەل و تێشووی ڕێگایە. ـــ ی ئــاوێ لــە لەشیدا کۆدەبێتــەوه، ئاڤزەلــەنگ. ـــ ی ژەهــر: کیســەی ژەهری، توورەکەی ژەهری.

تۆربە

**تۆڕبە:** تۆربە.

**تۆرتان** (باک.): مەگریجەنی، دووارد. مقەست.

**تۆڕتۆڕ:** جووره ترێیەکی ڕەشی دەنک چکۆڵەیە.

**تۆڕتۆڕاویلکە:** چتی زۆر تراو.

**تۆڕتۆڕه:** تەمبەڵ و بێکاره، خاو.

**تۆڕتۆڕەوان:** بڕوانە: تۆڕەوان.

**تۆڕتۆڕەوانی:** بڕوانە: تۆڕەوانی.

**تۆڕتۆڕکاو** (ئەردە.): تۆڕتۆڕاویلکە.

**تور:** لاڵ و پت، کەسێکە قسەی بە ڕەوانی بۆ نەکرێت.

**تورتۆڕی** (باک.): جووره ترێیەکە.

**تۆرجەل** (باک.): کێوێکە بڵندە و ئاوداره لەنزیک شاری دیرکا.

**تۆرڤان** (باد.): تۆڕەوان، ڕاوکەری ماسی و باڵندان بە تۆڕ.

**تۆرکردن:** تۆران.

**تۆرم** (باک.): دەیلاخ، فەرخەووشتر.

**تۆرن** (باک.): نەتەوه، نــەوه، نــەڤی، کوڕەزا، نــەبیره. خانــەزا، خانــەدان، کابۆش. (باک.) ـــ ی: خانەدانی، کابۆشی.

**تۆرۆس:** کێوی تۆرۆس، زنجیره چیایەکە کەوتۆتە کوردستانی باکووریەوه.

**تۆڕی** (هەو.): خووێڕی، بارنەبەر، سەرکێش.

**تۆری** (باک.): چەقەڵ، توورگ. خــەڵکی(تۆر) ی کــە مەبــەس لــە(توری عابدین)ە.

**تۆریان:** زیزبوون، تۆران.

**تۆریاو:** تۆراو، زیز.

**تۆریک** (باک.): چەقەڵ.

**تۆرین:** تۆران.

**تۆڕینۆک:** کەسێکە زۆر بتۆرێ.

**تۆز:** گەرد، ڕتام، خۆڵ، وورده خۆڵێکە لە کەل و پەلان جووێ بێتەوه، تــەم، گەردان، تــۆزز. ـــ لــێ هەڵنەســتان: مەبــەس لــە بــێ سوودی و نابووتییــە. کــەم، نــەخت، بڕ، چک، هێند، پت، پرت، تۆزقاڵ، تۆسقاڵ. ـــ یــک: تۆزێک، نەختێک، پتێک، کەمێک، پچێک، پرتێک، خیچە.

**تۆزاڵ** (ئەردە.): نەخت، کەم، تۆزاڵ.

**تۆزانەوه:** بڕژانەوه و سووتانەوەی برین یا پێست.

**تۆزاندنەوه:** بڕژاندنەوه و سووتاندنەوەی برین یا پێست.

**تۆزاوی:** گلاوی، خۆلاوی، ڕتامی، تۆزاوین.

**تۆزاوتن:** تۆزاوی.

**تۆزە** (هەورا.): گەرد.

**تۆزەک** (باک.): ڕنەک.

**تۆزتەکنای** (هەورا.): تۆزتەکاندن.

**تۆزتۆزە:** کەمکەمە، بڕبڕە، بڕەبڕە، نەخت، نەختە، بەرەبەرە، پیچ پیچە، لەسەرەخۆ، بەکاوەخۆ.

**تۆزداوەشێن:** داوەشاندنی تۆز و خۆڵ.

**تۆزقاڵ:** تۆزقاڵە، زەڕڕە، ئاستەم، کەمووسکێک، کەمێک.

**تۆزقاڵبین:** ئاستەمبین.

**تۆزکردن:** کردنە تەپ و تۆز. ئاژاوەنانەوە، گڕو گێچەڵ بەرپا کردن.

**تۆزلانە** (ئەردە.): تۆزاڵ، کەم، نەخت، (ئەردە.) قیچ، قینچکە.

**تۆزلقان:** تۆزقاڵ.

**تۆزن:** تووڕە، سەرگەرم. تۆزاوی.

**تۆزوبا:** (باک.) بابالیسک. توزوخۆڵ، تەپ و تۆز.

**تۆزوخۆڵ:** تۆزوبا، تەم.

**تۆزێ:** تۆزێک، نەختێک، کەمێک، تۆزاڵێ، تۆزلانەیێ، قینچکەیێ، قرتکەیێ.

**تۆزێک:** تۆزێ.

**تۆژ:** توویژ، تۆژکە، تۆژک، تووشک، توێژ، توێژاڵ.

**تۆژینەوە** (کۆ.): وەشووێن کەوتن، لێ پێچانەوە، بە شووێن سۆراغدا گەڕان. ئێشی پێستی لەشی مرۆڤانە دوای ئەوەی، کە بەدەست یا بەدار و چتی تر لێدرێ.

**تۆژکە:** تۆشکە، کرێژ، توویژ، کەڤشک.

**تۆسقال:** بڕوانە: تۆزقاڵ، تۆسقاڵ.

**تۆسقاڵ:** بڕوانە: تۆسقال.

**تۆسقاڵە:** ئاستەم، ڕشک، ژەندیک، کەمووسکێک.

**تۆسقاڵ بین:** تۆزقاڵبین، ئاستەم بین.

**تۆسن:** سەرکێش، تۆڕ (بۆ وڵاخی)، بزۆز، تووڕە، سڵ.

**تۆسی** (ئەردە.): تووێسی.

**تۆش:** (باک.) ئەتۆش، تەژی، تووش. تۆژی. (باک.) تالان، بەردێ بەردان.

**تۆشاڵ:** توویژاڵ، توویژی شیر و ماست.

**تۆشە:** توویشە، زاد، زەواد، تێشوو. تێشووی ڕێبوواران، توویشوو.

**تۆشەبەرە:** تووێشەبەرە.

**تۆشەدان:** تێشوودان، هەمبانە.

**تۆشک:** توویشوو: تێشوو.

**تۆشکان** (ڕۆژ.): فێراندنی باڵندانە بەلاق و لەتەنی خۆیاندا.

**تۆشکاندن** (ڕۆژ.): تۆشکان.

**تۆشکە:** توویژ، کرێژی سەر و لەشی چڵکن و برینان. کرێژی سەری کەچەڵانیشە.

**تۆشل** (باد.): تێکوڵی دار.

**تۆف:** (هەورا.) کات، هەرەت، تاف، دەم، جەنگە. (ڕەوا.، سوور.) باووبارانە. ـــ دان: لەنێوچوون، نەمان. (کە.) تووشی گەرمای سەخت، چەقەی گەرما. (باک.) دەستە، هەمیشە. ـــ بوون: وێچوون. ـــ کرن: وێچوواندن. کرێوە، کاتی سەرماوسۆڵە بەفروبارانەیە، کە نە جووت دەگەڕێ و نە ئاژاڵیش دەچێتە دەرەوە بۆ لەوەڕ.

**تۆفاڵ** (ئەردە.): تڵپە. ژەنگ و توویژی مسی. تۆپەڵە قوڕی گچکەیە، کە بە میچی دادەدرێ و لەسەرویشەوە سوواخ دەدرێ.

**تۆفان:** تۆف، باهۆز، کرێوە، بادووە، ـــ ی ئاو: فرتەنە، فرتێنە.

**تۆفانە:** مێشوولە، خاکە.

**تۆفە:** مۆرە، تفە، (بابا.) موور. ئەو دیوارە بە ـــ دروستکراوە: واتە بە مۆرە (تەنها بە قوڕەپەستە) دروستکراوە.

**تۆفر:** تێکوڵ، تۆکڵ.

**تۆفل** (باد.): تۆشل. (باک.) کووز، قاش، پارچە. (باک.) تیفل. ـــ یێک شووتی: کووزێک شووتی.

**تۆڤ** (باک.): دان، تۆو، تۆم. ـــ ئاڤێتن: تۆچاندن، تۆوەشاندن.

**تۆڤ ئاڤێتن:** تۆوی چاندنێ.

**تۆڤال** (ئەردە.): تڵپە، تڵتە.

**تۆڤچێن** (باک.): تۆوچێن. (باک.) ـــ ی: تۆوچێنی.

**تۆڤ وەشاندن:** تۆ وەشاندن، تۆ چاندن.

**تۆڤی** (باک.): شووتی و گندۆرە و ترێزو و خەیار و تەڕەکاری ترە، کە بۆ تۆوی هەڵدەگیرێ تا ووشک دەبێ و دەپڵیخێتەوە و بەکاری خوواردنێ نایەت تەنها بۆ تۆوە.

**تۆق:** (دەر.) قەڵادە، قەڵیتە. تۆقی مل. ـــ ی سەر: تەپلەسەر، تەوقی سەر. باڵندەیەکی ڕەشی پنک پنکی زەردە هێندەی ڕەشۆڵەیێکییە. (هەو.) تۆقەڕەشکە. تۆقی گاسنی، تەوقی گاسنی، تەوقێکە لە دار یا لە ئاسن، کەمەرەیێکە لە دار یا لە ئاسن لە چتی شکاو یا هی بەترس دەکرێ. (باک.) گەردنبەندی ژنانە لە زێڕ یا لە زێو، ملوانە، ملوانکە.

**تۆقات** (کۆ.): شەپەلاخە، شەقەزللەی پژملێیە.

**تۆقان:** تۆقین، ترسان، زراوچوون، ترەقان. تەقینی چەک و ئیتر.

**تۆقاندن:** ترساندن، زراوبردن، زەهلەبردن، تووقاندن، تووقانن. تەقاندنی چەک و ئیتر. تەقاندنی زیپکە و بلۆق.

**تۆقانن:** تۆقاندن.

**تۆقە:** ـــ کردن: دەستی هەڤ گوڤاشتنە، دەستی یەکتری کوشین. (دەر.) شەپەلاخە. (جز.و بۆتا.) تکا. (هەورا.) تۆقی سەر، تەپڵی سەر. ـــ ی سەری ئافرەتان. (هەو.) تاقتاک کەرە، تاقتاقەکەرە، باڵندەیێکە وەکوندی دەچێ، کە دەخووێنێ دەڵێ تووک، تۆک.

**تۆقەڕەشکە** (هەو.): مێروو، تۆق.

**تۆقەسەر:** تەوقەسەری مرۆ، پاتک. گاسک، تافنە، (هەورا.) تەپڵۆسەرەی. ـــ ی چیایان: چەقەرە. تەپڵەسەری چیایان.

**تۆقکردن:** ماندووبوونی منداڵی ساوا لەبەر زۆر گریانێ.

**تۆقلە:** (شا.) گۆپکە، چرۆ. (بابا.) پۆرگ. شووێنێکە لە ئەندام، کە هەڵتۆقیبێ.

**تۆقلەكردن:** هەڵتۆقین، هەڵزرەپان، لیركردنی ئەندام، هەڵزڵەپان.. هەڵتۆقینی كەڵبەی هەنجیر.

**تۆقیان:** (ئەردە.) تووقیان. ترەكین، درزبردن، تۆقین. توف، تاف، لێوڕێژی، بەسەردا زاڵبوون.

**تۆقین:** تەقینی چتێكی تەقەمەنی، (باك.) هەلترەقین، پەقین. ترسان، زەهلەچوون. تۆقان.

**تۆقێن:** تۆقێنەر.

**تۆقێنەر:** تۆقێن.

**تۆقیو:** ترساو، زراوچوو، زراوبراو.

**تۆك:** (باد.) تۆقە، باڵندەییێكە وەكوندی دەچێ، كە دەخوێنی دەڵێ: تۆك، تووك، باڵندەی شەوێیە. (هەورا.) تاقتاقكەرە. (ئەردە.) تووێك، تێكوڵ، پۆس، پێس.

**تۆكەتان:** تۆوی ڕووەكی كەتان.

**تۆكەرانێ** (ڕەوا.): زۆرەوانێ، زۆرەبانێ. مل ملانێ.

**تۆكەنگر:** (بلّ.) قەلنۆشە.

**تۆكردن:** تۆو چاندن.

**تۆكڵ** (زەن.، سوو.): تێكوڵی هێلكە و دار و ئیتر. (هەورا.) تووێژ، تۆفر.

**تۆكمە:** چتی قورس و پتەو.

**تۆكمەچی:** كەسێكە چتی تۆكمە داڕێژێ.

**تۆكمەوڵە:** پۆس هەوڵە، پیستی ئاوڵە و خروێركەی.

**تۆڵ:** (ڕۆژ.) پس، پز (جەنین). ـــ پڕ: پینگاوتینگ هاتوو، ئاووس. منداڵێكە لە زگی دایكیدا بێ. ـــ دار: ئاووس، بەتۆڵ. (باك.) تۆڵە. (ئەردە.) تەڕ، بەتەنێ نا بەڵكوو لەگەڵ(تەڕ)ی بەكاردەبرێ. تەڕوتۆڵ. توولە. جوورە تەنراوێكی دەستییە سەوز دەكرێ و دەكرێتە كەل و پەل. كوڕی لاو. سەگێكە تووكی كورت بێ، تولـە. ژنی چاو لەدەرێ، حیز، قاحپە. سووزانی.

**تۆڵ:** توولە. (باك.) تۆڵە. ـــ خووە ڤەكرن: تۆڵەی خۆكردنەوە. (باد.) حەیف، موخابن.

**تۆلا:** تەلاشێكی ئەستوورە لە پەنیر و گەزۆی داگیراو، تەلا.

**تۆلاز:** (ڕۆژ.، خۆ.، زا.، شكا.، ڕەوا.) بزۆز، حالوز، جەربەزە، بۆ نێرەكەران بەكاردەبرێ و جارجارەش بۆ جنێو بۆ گەنجانیش بەكاردەبرێت. (باد.) جحێڵ، لاو، گەنج. (باك.) گێل، حۆل. چاو لەدەرێ، داوێن پیس. ـــ ی (خۆ.): گەنجی، لاوی، جحێڵی. (باك.) گێلی، حۆلی. (خۆ.) گەمەیەكە. (باك.) چاو لەدەرێ بوون، داوێن پیسی.

**تۆلاس** (دەر.): تەورداس.

**تۆلاش:** تەلاش. (باك.) پێست و تێكوڵی میوە. (شارە.، هەورا.) تلاش، تیكوڵی داران.

**تۆلاشە** (ئەردە.): تەلاش.

**تۆلە** (موك.): تۆل، پس، پز. منداڵێكە لەنێو زگی دایكیدابێ. جوورە پارچەییێكە، كر، قماش. (باك.) تولەسەگ.

**تۆڵە:** تۆڵەكە. توول. گونجە، ئاڤدین، ئەڤدین، تۆل، زڕمتانە، دفنان، تۆلاڤ، (ئەردە.) قەرەوی. پاداشی چاكە یا خراپەدانەوە یا كردنەوە. بژاردنی چتێك لە جیاتی چتێكی تر: لە ـــ ی بزنێكیدا مەڕێكم دا.

**تۆڵەئەستاندن:** تۆڵەكردنەوە، تۆلاخووەڤەكرن. توول كرن، زڕمتانەكردنەوە، حەیف هەلاندن.

**تۆڵەترش** (باد.): مام ڕێواس.

**تۆڵەدانەوە:** بۆ بژاردن، بۆ ئەژماردن، هۆدانەوە، تێ هێنانەوە، خستنەوەجێ.

**تۆڵەزڕە:** ڕەزەڵە، گیایەكی بەهارییە بەرێكی سووری ووردی مزر دەگرێت تامی تەماتەی دەدات.

**تۆڵەڤسك** (باك.): قەڵەمباز، هەڵبەزین، هەڵتۆقین.

**تۆڵەكە** (هەو.، هەورا.): نانی حاجی لەگلەگی، (باد.) تۆڵكە، تۆلك. تۆولەكە، تۆڵە. گیایەكی بەهارییە و دەخورێ بەچێشت یا بەكاڵی بخورێ نەرمی بە زگ دەدا و كەمێك ڕەوان دەبێ، كە بكوڵێنرێ ئاوەكەی بەیانیان بخورێتەوە بۆ كرم سوود بەخشە.

**تۆڵەكردنەوە:** تۆڵەسەندنەوە.

**تۆلبەند:** قۆڵبەند، (هەورا.) بازی بەند. باسك بەند.

**قۆلبەندی باڵ:** قۆڵبەند.

**تۆلپڕ:** ئاووس، زگپڕ، دووگیان. ـــ بوون: ئاووس بوون، زگپڕبوون. ـــ كردن: ئاووسكردن. ـــ ی: ئاووسی.

**تۆلدان** (باك.): تۆڵەئەستاندنەوە. لە باكووردا لەباتی جەژنی نەورۆزی جێژنێكی بەناوی ـــ دەكەن.

**تۆلك** (باك.): تۆڵەكە.

**تۆڵكە:** بڕوانە: تۆڵەكە.

**تۆم** (ڕۆژ.): تۆوی خواردن و چاندنێ.

**تۆماتێز:** تەماتە.

**تۆمار:** چەند نامەییێكی نووسراوی خەتخۆشە، كە بەچریش سەرەكانیان لێك دەدرێ و لوول دەدرێ تا قوتابی كەمكەمە بیخوێنێ و لە بەری بنووسێتەوە و لەسەری فێرە نامە نووسین و خوێندنەوە بێ. زابەند. ـــ كردن: زابەندكردن.

**تۆمانج** (ڕۆژ.): بوختان، شڵتاخ.

**تۆماندن** (باك.): بوختان، بوختان پێكردن.

**تۆمانی** (باد.): جوورە هەرمێیەكە.

**تۆمە** (هەورا.): تۆوی خواردن و چاندنێ.

**تۆمەڵێ:** (موك.) مەمنا. (هەورا.، هەو.، بلّ) تومەز. تمەز. (بلّ.) توومەز. (جا.) ووتمەز.

**تۆمەڵێ:** واتای پێچەوانە و جارجارەش هەڵكەوت دەگەیەنێ: چوومەلای دارا تۆمەڵێ لەپێش مندا دەركەوتبوو. فەرهاد دەچووە لای كاوەی، تۆمەڵێ كاوەش بۆلای وی دەهات و تێكهەڵەنگووتن.

**تۆمێز** (هەورا.): مستەكۆڵە.

**تۆمچێن** (ڕۆژ.): تۆوچێن.

**تۆمشان** (هەورا.): تۆوچێن.

**تۆمک** (وان.): دان و گۆشت و چتی وایە، کە بۆ نێچیران دادەنرێتەوە.

**تۆمکەتان** (هەورا.): تۆکەتان.

**تۆم وەرەش** (هەورا.): دەغڵفرۆش.

**تۆن**: تی تۆن. (باک.، چیا کرمانج.، کورداغی) ئاوا، ڕەنگ، چەش، چلۆن، چاوا، شێوە: بڤیێ تۆنی: بەوچەشنە، بەوجوورە، ئاوا. (باک.) گۆشتی کوتراو و لە قوتووا ندا ئاخنراو. کێشێکە برێتییە لە هەزار گرام.

**تۆنێل**: چەپکەن، چەپگەن.

**تۆو**: تۆڤ، تۆخم، تۆ. (هەورا.، ڕۆژ.، زەن.) تۆم. تۆمە. (دەر.) تووێم. ـــ چاندن: تۆڤ ئاڤێتن. تۆی قرتاندنێ وەکوو تۆی کوولەکە، تۆگوڵەبەڕۆژە، تۆشووتی، تۆکاڵەک و ئیتر.

**تۆوبێستان**: تۆوی کاڵەک وشووتی و ترێزو و خەیار و ئیتر.

**تۆوچان**: چارۆکەیەکە تۆوچێن تۆوی تێدەکا بۆ چاندنێ، تۆوبەرە.

**تۆوچێن**: تۆو وەشێن، تۆم چێن. تۆوکار، تۆوکەر.

**تۆول** (باک.): تێکوڵی داران.

**تۆوڵەکە**: تۆڵەکە.

**تۆولۆ** (ڕۆژ.): دە، دەنێو، لەنێو، تووێ، ناوەند، نێوەڕاست. ـــ ی لێفە: دەنێولێفەدا. ـــ ی قاقەز: لە تووێی قاقەزیدا. بە ـــ ی کراسی: بە تووێی کراسیدا.

**تۆی** (بابا.): تووێ، تۆولۆ، لۆ.

**تۆیانە** (بابا.): شیرنیات و نوقڵێکە دەخرێتە نێو کالای بووکەوە لە ماڵی زاواوە دەنێردرێ.

**تۆیژ**: تووێژ.

**تۆیژاڵ**: تووێژ.

**تۆیسوو**: توویس، تۆسی، تێسوو.

**تۆیشەبەرە**: نان وزادی ڕێگەی سەفەر.

**تۆیی**: هی تۆ.

**تو**: (باک.) هیچ کاتێک، هیچ دەمێک. ـــ جارا: هیچ جارێکی. ـــ کس: هیچ کەس. ئەتۆ، تۆ، تە. سەرتوو، قەیاخ، تووژ، تووژگ. پەڕ، قاقەز، تووێ.

**توپوخ**: سەرەنگری، ساتمە.

**توت**: کوندەبۆ. دانیشت بە زاراوەی منداڵان: توتیکە: دانیشە.

**توتە**: تووتە، ووشەیەکە سەگی پێدەر دەکرێ.

**توتەکۆڵە**: تووتە، توتکە سەگ.

**توتک**: تووتک، تووتکە: جوورە کرمێکە هەرکەسێکی سەگی هار گرتبێتی دایدەنێ. (باک.) مریشک.

**توتکە**: تووتکەسەگ.

**توتکەسەگ**: بێچووی سەگ.

**توتم**: بڕوانە: تووتم.

**توتوخاندن** (باک.): تلۆوخاندنەوە، ووردکردن، شکاندن، فلیقاندن.

**توتو**: مریشکی پێ بانگ دەکرێ بەڵام ئەم ووشەیە بەپیتی ئارەوی و لاتینی نانووسرێ.

**توتوخین** (باک.): شکان، تلۆوخان، تلۆوخانەوە، فلیقانەوە، ووردکران.

**توتوک** (باک.): تووتەک، زوڕنا، شێپۆر.

**توتوم**: توتم، سماق.

**توخت** (باک.): سەنگی (٥٠) درهەمییە، سەنگایێکە بەرانبەری (٥٠) درهەمییە.

**توخس**: گیانداری چەمووش، تۆڕ. چارەوی یا ڕەشەوولاخێکە، فێری سواری و بارەبەری و جووت نەکرابێ، تۆڕ، سرک. گەند، لەناوچوو، هەترەبوو، ئاوارە. لەدەستچوو.

**توخس کردن**: لەناوبردن، بەترەفکردن، لەدەستدان.

**توخم**: تۆو، تۆم، توو. نەژاد، ڕەسەن، ڕەچەڵەک، توورم.

**توخماخ**: سەرپانکردن.

**توخمە**: خەمەرە. چیکڵدانە تێچوون لە زۆر خواردن.

**توخمە تەخێڵ**: توخمەتخێڵ، توخمەحیز، بیژوو.

**توخمەتخێڵ**: توخمەتەخێڵ.

**توخمەحیز**: بیژوو، زۆڵ. بیژووزادە.

**توخم سپی**: تۆکوولەکە، تۆکودی.

**توخن**: قەرەکەوتن، نزیک بوونەوە لە چتێک.

**توخنکەوتن**: قەرەکەوتن، نزیک کەوتن.

**توخووب** (باد.): سنوور.

**توخوت** (زا.): چارەگە حۆقەیەکە.

**توخوون**: توخن، نزیک، قەرە. ـــ بوون: نزیک بوونەوە. ـــ کەوتن: نزیک کەوتن.

**تور**: مەردومی تور، پسک، لاڵەپەتە. (باک.) توورەتووڕی بۆڕی و زوڕنا و هۆڕنی خۆشبەزان. (باک.) توورەکە، خورج، خورجێکی گچکەیە.

**توراپ** (زەن.، کەل.): نێوی نێرینانە بەڵان توراو دەخوێنرێتەوە.

**توراو** (زەن.، کەل.): توراپ. نێوی نێرینانە بەڵان بە توراپ دەنووسرێ.

**تورەتور**: ترەتر.

**تورِ ڕەهات**: گرزە، (دزە.) زیف. هیچ و پووچ، پڕوپووچ.

**توربە**: تۆربە، جوورە کیسەیەکی گەورەی تەنراوە شتوومەکی تێدەکرێ، توورەکە، کیسە، هەگبە.

**توربێن**: توورەکە، تورک.

**تورت**: جوورە تامێکە لە تفت کەمترە. لاڵەپتە. ناسک، چتێکە لەشکانێدا زوور بپەڕێ.

**تورتەماڵ** (ئەردە.): لاپاڵ وهەڵدێرگە. توننە، لێژایی.

**تورتی**: ناسکی.

**تورخ**: تولخ. ترێ یا میوەیێکە هێندە گەیشتبێ، کە لەخۆڕا بتلۆوخێتەوە.

**تورخە** (ڕۆژ.): نەخۆشیەکە بەهۆی زۆر خواردنێوە ڕوودەدات.

**تورش**: ترش، چتێکە تامی ترشی بدات.

**تورشان**: ترشان.

**تورشاندن**: ترشاندن.

**تورشانن:** ترشاندن.

**تورشاو:** ترشاو.

**تورشکە** (ڕۆژ.): ترشۆکەی گەلاپانە، گیایەکە.

**تورشکە:** ترشۆکە (گیایەکە). تورسێنەک.

**تورش و شیرین:** مەیخۆش.

**تورشی:** ترش، تامی ترش.

**تورشی:** ترشیات.

**تورشیات:** ترشیات.

**تورشیاگ** (ئەردە.): ڕووترشاو، ناوچاوترشاو، ڕووترس.

**تورشیاگ:** ترشاو، گەنیگ.

**تورشیان** (ئەردە.): ترشان، هەلاتن بۆ هەویر و چتی تر. کف هەلاتن. ڕووگرژکردن، ناوچاوان تێکنان.

**تورشینەک:** تورشکە، ترشۆکە.

**تورک:** توورەکە.

**تورکەش:** تیردان، تیرکێش.

**تورکمان:** تورکمەن.

**تورمە:** زێوی پاکی بێ خەوش. ئاوریشم: ئەم قاقەزە یا ئەم کرە (تورمە) یە. کری ئاوریشم.

**تورمتە** (ئەردە.): هەڵەکەسما. بڕوانە: تورنتە.

**تورنتە:** واشە، باشوو، باڵندەیەکە لە کۆتر گەورەترە ڕاوی چۆلەکە و کۆتران دەکات.

**تورنج:** ترنج.

**تورۆ:** بڕوانە: ترۆ.

**توروسکە:** تروسکە.

**توروکە:** تڕووکە، لێکنان.

**توروندی** (شار.): خوێڕی.

**توری:** پسکی، فسەزمانی.

**توز:** چوز، خەڵفی داری ناسکی باریکی تازەیە. ڕەنگ: ـــ بارام ڕەنگی نەماوە.

**توزیلانە** (ڕەوا.): خلۆر. ـــ کردن: خلۆرکردنەوە.

**توژ** (باک.): تیژ (چەقۆ و خەنجەر و شیرو ئیتر). تیژ وەکوو تامی پیواز و ئیسیوەت.

**توژماڵ** (فە.، لو.، لەک.): سەرداری سەرۆک خێڵانە، کە بە تۆڵکێشانی وان دادەنرێ و یا لێ دەخرێ.

**توس:** تووێسی، تووێسوو.

**توش** (باک.): تۆش. گەمەیەکی مندالانە.

**توشتیر** (هەر.): گیسکە مێیە، کە تەمەنی لەنێوانی یەکساڵی و دووساڵیدابێ. (زا.) گیسکە مێیە، کە سێ ساڵییە.

**توشماڵ:** دیواندر، پێشەوا، سەرۆک.

**توک:** نووک، نێش، چزوو. (باک.) تف. توز، ڕەنگ، بارامـــی نەماوە، واتا ڕەنگی نەماوە.

**تول** (ئەردە.): توولە. تولە، جوورە سەگێکی گچکەیە.

**تولا:** توو تلەشێکی ئەستوورە، کە لە پەنیر و یا گەزۆ.

**تولابی:** تیرەیەکە لە لوڕی گچکە لە لوڕستانێدان.

توله. (لو.) تۆڵەکە.

**تۆلە:** تۆڵەکە.

**تولە:** توولە، جوورەسەگێکی گچکەیە، (کە.) فینە، (خۆ.) توولە. (باک.) تۆلە. ـــی کێوی: توویک.

**تولەفاتر** (تاو.): چاوتێستر.

**تولەک** (ئەردە.): توولەک. ـــ کردن: تووک هەڵوەراندن.

**تولخ:** تورخ، پووخ. میوە یا تەرە کارێکە لەبەر زۆرگەیشتنی بتلۆوخێتەوە و بفلیقێتەوە.

**تولخانەوە:** فلیقانەوە، پورخانەوە.

**تولخاندنەوە:** پوورخانەوە، فلیقاندنەوە.

**تولخی** (مەک.): جوورە ترێیەکی سپییە و خاڵخاڵی زەردە، گلووی خڕە وەکوو فەرخی دەچی ودەنکی هەیە.

**تولومپا:** توورومپا.

**تولونگی** (ئەردە.): بێ شەرم، بێ ئاوڕوو، لۆتی.

**تومەز** (هەورا.): هەو، بڵ، توومەز، تەمز، تۆمەز، تۆمەڵێ، تۆمەبێژە، ووشەیێکە لەبارێکدا بەکاردەبرێت، کە مرۆ بەهومێدو چاوەڕێی کەچی بەپێچەوانە ڕوودات: ئەمن چووبوومە ماڵی کاکم، کەچی لە ماڵ نەبوو، تومەز لەپێش منداچووبووە دەرێ.

**تون:** توند. سفت، سەخت. تیژ. تووش، شیرەت، ڕووش، توورە، زوویر. گورج، خێرا، توند، توندوتۆڵ. لێژ، لێژایی، سەرەوژێر.

**تونەوبوون:** توندبوون، پەیت بوون.

**تونەوکردن:** توند کردن، سفت کردن، پەیت کردن.

**تونبوون:** توندبوون، ئاڵۆزبوون، توورەبوون.

**تونج:** کانێکە وەکوو مسی وایە بەڵام لە مسی قایمترە. (باک.) ناوی چیایەکی ناوداره لە کوردستانی باکوور.

**تونجک** (زا.): پەرچەم.

**توند:** پەیت، خەست، کەماچ. چتێکە شل نەبێت. مەحکەم، قایم، پتەو، بەجەم. چتێکە لەشوێنی خۆیدا نەلەقێ وقایم بێ. گورج، خێرا، چوست، تەڕدەست، تیژ، بەپەلە، گوژمە، قۆچاخ، گورج وگۆڵ، چالاک، زیت، پەرداخ، تەتەر، تەلان، پەل. خێرا، پەلە. ـــ بڕۆ: خێرابڕۆ. ـــ کردن: تاودانی وولاغ. تیژ، توندوتیژ (تام.). توورە. ـــ کردن: توورەکردن. توورە، دەمارگرتوو، توندوتیژ. ـــ بوون: شەمۆتەوان.

**توندە:** بڕێتییە لەچێشتی قوبوولی وپلاو.

**توندبوون:** قایم بوون، مەحکەم بوون. خێرابوون.

**توندبوونەوە:** خەست بوونەوەی چتی شل. قایم بوونەوەی چتی لەق.

**توندڕەو:** تیژڕۆ، خۆشڕۆ.

**توندڕەوی:** تیژڕەوی، تیژڕۆیی.

**توندکردن:** قایم کردن، مەحکەم کردنەوەی چتی لەق. تاریک بوونی ئاسمان بە هەوری تیر.

**توندکردنەوە:** قایم کردنەوەی چتی لەق. خەست کردنەوەی چتی شل.

**توندوتۆڵ:** تازا، چالاک، گورج و گۆڵ، چەلەنگ، (رەوا.) پەیت و پۆر، چوست و چالاک. ـــ ی: چوست و چالاکی، تەتەری.

**توندوتیژ:** توورە، توند، دژ، گرژ، مۆن. ـــ ی: توندی، توورەیی.

**توندی:** توورەیی. تیژی، کەسکوونی، سەختی و ئاڵۆزی.

**تونگ:** تونگە، گۆزە.

**تونگە:** بقبقە، شەربە. (باک.) پیپۆک. بەن یا دەزوویەکە جۆڵا لەپاش رایەڵکردنی دەیکا بە گلۆڵە.

تونگە

**تونگخانە:** (کە.) توون، کوڵخەن. (هەو.) کوڵخانە، کوورخانە.

**تونگخانەچی:** کوڵخانچی.

**تونگخانەچێتی:** کوڵخانچێتی.

**توننە (تونە)** (باک.): تنە، تننە. نیە.

**تون و تاڵ:** توندوتاڵ.

**تونوتۆڵ** (هەورا.): توندوتۆڵ.

**تونوتۆڵ** (هەورا.): توندوتۆڵ.

**تونوتیژ:** توندوتیژ، ترشێکی گەزندە، تیژێکی وا ئاو لە چاو بێنێ. توندوتۆڵ، گورج، قۆچاغ، چالاک.

**تونی:** توندوتۆڵی، گورجی. توندی، توورەیی، ئاڵۆزی، قەڵسی. تونە، توننە.

**تونی:** سەختی، دژواری، تەوەژم، تەوەژمی سەرما یا گەرما.

**تونیانەوە:** توزیانەوە، کاریانەوە. تۆزانەوە.

**توی:** تۆی، نەتۆی.

**توو:** (هەورا.) تفی. (باد.، باک.) تی. (زاخ.) تووک. (دەر.) تووی. (رۆژ.) تووێ. بەری دارێکە تووی سپی و سوور و رەش دێنێ بەدارەکەش هەر دارە توو دەڵێن. تووی فەرەنگی: چلەک. ـــ ی رەش: تووشامی، گاتوو، تووێم شامی. داری توو یا بەرەکەی. (باک.) قەمیاغ، تووێ، سەرتوو، سەرتووێ. (موک.) تۆ، ئاو (مەنی). ـــ تکان: ئاو رژان. ـــ تکاندن: ئاو رژاندن، تەنها بۆ کوڕان بەکاردەبرێ واتا منداڵی نابێ. (باک.) تۆ، نەتۆ، تە، تێ. تۆو، تۆم، هی چاندن و قرتاندنێ.

**تووء:** قراش، ئەنجنراو (گۆشت و ئیتر).

**توو‌ا** (رۆژ.): تەشقی سەرما و گەرما. باری رۆژگار لە لایەن گەرمی و ساردییەوە.

**توووار** (باد.): باڵندە، پەرەوور، پەلەوور.

**تووواشا:** بروانە، ببینە، بنۆڕە، تەماشا. دیتن، روانین، نوارین، سەرنج، ووردبوونەوە، چاوپێکەوتن، خوێندن.

**توووشاخانە:** تەماشاخانە، سەیرانگا.

**توووشاکردن:** تەماشاکردن.

**توووالێت:** (زا.) گوودلە، پووتک.

**توووان:** تەوان.

**توووانا:** تەوانا، بەدەست، دەستەڵاتدار، دەستدرێژ، بەتاوو تاقەت، بەهێز، هێزدار. ـــ بوون: پێکران. لە ـــ دا بوون: تووانران. هێز، تاو، تاووشت، تووانشت.

**تووانایی:** (فە.) هەرەنگ. تار، تاووش، تووانشت. (باد.) خور. (باک.) بەندەری، بار. تەوان، تووان، دەست و دوو، قوونەبان، وێزان، بڕکردن، پڕکێشان، شنگ، هوومێن. تاو، تاب، باران، هێز، ووزە، توانایی، پێز، گیر، بڕشت.

**تووانەوە:** (خۆ.) تافانەوە. ((دەر.) تێوانەوە. (زەن.) تاوانەوە، تاویانەوە. (دزە.) خێورانەوە. توولانەوە. (باک.) بڤەشین.

**تووانج:** لاتار، پلار، پڵلار. (هەورا.، دەر.) پەلار. تەشەر، تانووت، سەرکۆنەکردن، قسە هاوێژتن بۆ یەکێک، (ووتەی پۆشراو).

**تووانەوە:** تافاندنەوە، تاویاندنەوە، تاواندنەوە، خێوراندنەوە، تۆڵاندنەوە، ماشاندن. (دەر.) تێواندنەوە. (باک.) بڤاشتن، بڤەشاندن.

**تووانران:** لە تووانادابوون، پێکران.

**تووانشت:** توانست، توانین.

**تووانین:** (دەر.) توویەنین. (باک.) شان، شێن، کارین. (هەورا.) یارای، تاوای. بڕکردن، بڕکێشان، لە خۆڕادیتن، پێکران، شیان، کارین، دەروردن، تووانایی، تانین.

**تووایهم:** پیتی پەسندکردنە وەک ئافەرین.

**تووە:** پرگە، خۆڵێکە بەسەر بەفریدا دەکەن تابتوێتەوە.

**تووەتووە:** تووکەتووکە، پرووشە پرووشە، کەمکەمە بارین.

**تووەڕەشە:** شاتوو.

**تووەسوورە:** شاتوو، گاتوو.

**تووەمۆرە:** جوورێکە لە تەرەتوو، مۆرکارە.

**تووەنی** (هەورا.): بەرد.

**تۆوبەرە:** توورەکەیێکە تۆوی تێدادەبرێ بۆ ناو زەوی و زار بۆ چاندنی.

**تووبەرە:** توورەکە، قوماشی درواو بۆ تێکردنی شت، جوورێکی لە وەری وولاخ.

**تووپەڵ:** تۆپەڵ، تۆپەڵە.

**تووپەرک** (شن.): تووک لەکاتی نەکێشان و چاو پێ هەڵێناندا بەکاردەبرێ. توم (کرکی شێوەی موکری نانووسرێ).

**تووپلاخە:** بە سەریەکدا کەڵەکە کراو، بە سەریەکدا هاتوو.

**توویبیگ:** مردار، تۆپیو.

**تووپین:** تۆپین، مرداربوون، منداربوون. تێخورین، ترساندن، بۆڵەکردن.

**تووت:** (لو.) توو. (باک.) کوم رەفێنە، کلاو رفێنە، گەمەیەکە، کە چەند منداڵێک بە چەمبەردادەنیشن، یەکێک کلاوێکی لە پشتی وان دەگەرێنی ویەکێک بەدەوریاندا دەگەرێ تا دەگاتە شوێنی خۆی، ئەگەر ئەوی رۆنیشتوو ئاگای لە کلاوەکەی نەبوو و کلاوەکە گەیشتە سەروی، سوواری دەبێ و دەبێ بە دەوری چەمبەریدا بیگێرێ تا دەگاتە جێگای خۆی. تووتە، توتە، توت. ووشەیێکە سەگی پێ دەردەکرێ.

**تووتاک** (زا.): قومری.

**تووتاندن** (ئەردە.): سەرنانەسەر بۆ هێنانە قسە، دووانـدن، سەرەسەرنیان.

**تووتانن**: تووتاندن.

**تووتە**: بۆ دەنگدان و دەرکردنی سەگان بەکاردەبرێ. (هەورا.) سەگ، توتکەسەگ. (ئەردە.) گۆرانییە. گۆشتێکی زیادەیە لەسەر پێلوی چاو پەیدادەبێ، ڕەش بالووک، بالووک ڕەش. بڕوانە: تووتەڵە، قامکەتووتەڵە.

**تووتەک** (موک.): باڵندەیێکی شەوێیە هەتا ڕۆژ هەردەڵێ هەم هەم، جارجارەش دەنێستری دەحیلێنێ. مۆزیقە، مۆسیقە، شایلۆغان، دوودەک، تاخمی مۆزیقە.

**تووتەک و باڵەبان**: شایلۆغان، تووتەک. تاخمی مۆزیقە.

**تووتەکۆڵە** (هەورا.): توتکەسەگ، گوجیلەسەگ، تووتە، بەچکەسەگ، تووتەکوڵە، توڵەسەگ.

**تووتەڵە**: تووتە، قامکە تووتەڵە، قامکەکەی هەرەگچکەیە. قجقجیلک، تیلکێ قچیلک، قلیچ. (هەورا.) کلکە پووتە. تلیا قلیاچکێ، تلیا قەرەقوچکێ، کلکە پووتە، قچ، (ڕۆژ.) تووێتە. قلینجگرە. تووتک.

**تووترک**: دارێکی هەمیشە سەوزە، لەلایەن گەلاّ بڵندیشەوە هەروە گوڵەباخی دەچێ بەرێکی خڕی مەیخۆش دەگرێ وەک شاتووە بەلاّم ووردترە گەڵێ جار بۆ پەرژینی باغ و باغچە دەڕوێنرێ. (هەورا.) توودڕەی. (دەر.) تووڕک. دڕکەزی، کوونار، توودڕک.

**تووترواسک**: تیترواسک، تیتڵەپیچاخ، زیقاوڵە. باڵندەیێکە وەک چۆلەکە وایە بەلاّم کلکی درێژترە و زۆر دەیجوولێنێ هەندێکیش دەڵێن بەقەدەر کۆتری ئاوییە سپی و سەرباڵی ڕەشە ملی باریکە و هەمیشە دەزیقێنێ. (موک.) کلک هەڵتەکێنە.

**تووتک**: توتکەسەگ، بێچوەسەگ، گوجیلەسەگ، گجوڵە. (هەورا.) تووتەکۆڵە. (شا.) تووتیلە. (باک.) دارێکە، درەختێکە. بەچکەسەگ، تەتەکوڵە. تووتی.

**تووتکە**: توتکەسەگ، گوجیلەسە. کرمێکە هەر گیانلەبەرێکی هاربووبێ دایدەنێ واتا، کە سەگی هارگرتبێتی لەپاش ماوەیەکی دایدەنێ.

**تووتکەسەگ**: گوجیلەسەگ، بێچووەسەگ.

**تووتم** (ئەردە.): ترشی سماق.

**تووتن**: (دەر.) تووتوون، تەتن. (فە.، هەورا.) تەماکۆ، تیتن. چەند جوورێکە: تووتنی سامسۆنی، ـــ ی ڕەشۆکی، خواردە، تەوەس، ـــ ی نێرگە. گیایەکە گەڵا پانی تاڵە دەچێنرێ، کە ووشک کرایەوە بە جگەرە یا قەننە یا سەبیلە یان نێرگەلە دەکێشرێ. ـــ ی وورد: پەڵەخ. ـــ ی خۆشکێش: تووتنێکە نەزۆر توند و نەزۆر نەرم بێ. ـــ ی توند: جەمبەلی. ـــ ی سەبیلەی: (باک.) کاماش.

**تووتنانە**: شەکر یا دراوێکە یا چەند شیشە توتنێکە ئاغای گوندی لە خاوەند تووتنی دەستێنێ.

**تووتنەوان**: کرێکارێکە تووتن بەرهەم بێنێ. ـــ ی: کاری پاسەوانی کردن و بەرهەم هێنانی تووتن.

**تووتنجاڕ**: زەوییەکە تووتنی تێدا بکرێ.

**تووتوو**: هەڵکەوت، ڕێ لێکگۆڕان، بەهەڵە.

بەتوو تووش تووشی مەکتەب کەی دەهاتم من کەزانی بام
خەفەت، مەینەت، کەسەر، حەسرەت، بەشی ئینسانی زانایە
(هێمن)

**تووتووک** (باک.): پیکی زوڕنایە.

**تووتی**: باڵندەیەکە کەوی دەکرێ تاکتاکە فێرە ووشەش دەکرێ، بەقەد باشوورێکی دەبێ، ڕەنگی سەوز و سەری خڕ و دندووکی کەوانەییە و پەڕەووڕێکی جوانە.

**تووتیا**: کانێکە وەکوو فافۆنی وایە. تۆزی گیایەکی ناسراوە لە چاوی نێشاو دەکێشرێ.

**تووتیاکەوڵە**: مووروروی شینە (دەرمانە).

**تووتیلە** (شا.): توتکە سەگ.

**تووجی** (ئەردە.): بلاّوکردنەوە.

**تووچاندن**: تۆچاندن.

**تووچانن** (ئەردە.): فلیقاندنەوە، پانکردنەوە، کوتان.

**تووچن** (ئەردە.): چتی لنج، چتی چەسپ و گر.

**توودڕەی** (هەورا.): تووترک.

**توودڕک**: تووترک.

**توور** (باد.): بەخت: مـن خـۆ هاڤێتـە تووروبەختێ تە: مـن خـۆم هاوێژتە بەربەختێ تۆ. (باک.، باد.) وێژە، ڕێز، شێواز. نێوی کوڕی ناوونجی فەرەیدوونێ بووە، کە منوچیهر کوژتی. (جا.، هەورا.) ترپ، ترەو. تڤر. گیایەکی گەلاّپانە بنەکەی وەبنی چەوەندەری دەچێ بەلاّن سپییە. (باک.) لاسکی گیایان. هۆ، بۆنە، مایە. توورەکە، توورەبێن، جەوالی گچکە.

**تووڕ**: هەرێم، قۆڵ، توویر. توخس. تۆڕی ڕاوەماسی و پەلەوەر. فڕێ، ـــ دان: فڕێدان.

**توورق** (زا.): تۆراخ.

**توران**: وولاّتی ڕۆژمان، وولّکەی ڕۆژمیان. تورکستان.

**تووڕاندن**: تێ تووڕاندن، بۆڕی لێدان. فیڕاندن، هەڵتیزاندنی وولاّخ.

**تووڕانن**: تووڕاندن. فیڕاندن، ڕیخ کردن.

**توورە**: هەرێم.

**تووڕە**: جەرگاووس، ڕووترش، ڕووگرژ، دەهری، زوویر، سڵ، زیز، توندوتیژ، ڕابەل، سەرگەرم، ڕاگەش، توند، قەڵس، ڕووتاڵ، مۆڕ، ئەنگر، تاڵۆز، قوشقی، کەسێکە زوو هەڵبچێ، کەللەیی. خۆ ـــ کردن: ڕووتەهل کرن.

**تووڕەبوون**: سڵبوون، تۆران، خەیدین، زیزبوون، زوویربوون، گڤبوون، دڵگیربوون.

**تووڕەتووڕ**: دەنگی بۆڕی و بلوێر و ئیترە. قووڕەقووڕی سەگی لێدراوە.

**توورەزەڵە** (کە.): توورەزەرە. ڕێزەڵە. گیایەکە بەرەکەی هێندەی نۆکێکییە بەلاّن سوورە وەکوو تەماتەیە و دەخورێ.

**توورەش**: تۆوی پیوازی، کە ڕەش و ووردە وەکوو ڕەشکەی وایە. سیاوڵە، قاخلی.

**توورەشە**: شاتوو.

**توورەشک** (باک.): تووی ڕەش.

**توورەشووانە**: گیایەکە وەکوو گیای خەرتەلەیە لە لایەن تام و چەشنەوە.

**تووڕەق:** تووی ووشک.

**تووڕکانە:** بەشێکە لە خەرمان، کە دەدرێ بەسەرکاری ئاغای دێ دووای ئەستاندنی مڵکانە.

**تووڕەکە:** تـوورک. جـۆرک. تۆربـە. (بـاک.) تـوور، جوهـوور، جهـێر. (دەر.) تـووره. تووربێـن، تـوورک، تووبـەره، تـوو وەرە. جۆرکێکـە هەڵدەدروێت بۆ چت تێکردنی.

**تووڕەکەرێز:** گردێکە لەگڵ و خۆڵ، کە بەکۆڵی مرۆڤان دروستکرابێ بەبێگار. ـــ ی: کاری توورەکە رێژکردن.

**تووڕەکەشۆک** (شار.): (کۆ.) چرکی دزشاوێ.

**تووڕەکەی گەدایی:** توورەکەی دەرۆزە.

**تووڕەکردن:** خەیداندن، سڵ کردن، زیزکردن، تۆراندن، کەچەترێنکردن، دڵگیرکردن.

**تووڕەکێویلە:** (کۆ.) خەرتەلە. تووڕۆکە.

**تووڕەمەکی:** (خۆ.) تووکەرک. تـووی کێـوی. تـووی هەمەڕەنگـە. تفەزرێ.

**تووڕەوان** (سوور.): ئاودێر.

**تووڕەوانی** (سوور.): ئاودێری.

**تووڕەوتەنگاو** (کۆ.): تووڕەوتۆسن.

**تووڕەوتڕۆ:** کەسێکە لە خۆیەوە دڵگیر و سڵ بێ.

**تووڕەوتۆسن** (شا.، موک.): تووڕەوتەنگاو.

**تووڕەیی:** تونلوتیژی، سەرگەرمی، زیزی، ڕاگەشی.

**تووربێن:** (هەورا.) توورەکە، تۆشەبەرە. (شا.) بێ پێچە.

**توورتوور** (باک.): کرمی داران.

**تووڕتووڕکاو:** ئاوەکی، جلێتاو، تەڕ، شل.

**توورتێزک:** باروتخانە. کارگە و کارخانەی باروت.

**تووڕدان:** تووڕهەڵدان، فڕێدان.

**توورڤان** (باد.): ڕێژەوان. تۆڕەوان. کەسێکە بـە تـۆڕی ڕاوە ماسـی یـا پەڕەووران بکات.

**توورک:** (هەورا.) تووترک، توودڕەی. تەمشک، توودڕک.

**توورک** (باک.): توورەکە، خیگەی لوولەدار. توورەکە.

**توورکە:** زەوی سوورکاری دادڕدادڕ.

**توورگ** (هەو.): چەقەڵ.

**تووڕوان** (ئەردە.): تۆڕەوان.

**تووڕۆکـە:** توورەکێویلـە، تـووره شـووانە. گیایەکـە بـەتام و چـەش لـە خەرتەلەی دەچێ.

**تووڕهەڵدان:** فڕێدان، تێهەڵدان، دوور ئاوێژتن.

**توورى** (باک.): چەقەڵ.

**توورِیان** (دەر.): تۆران.

**تووز:** (بابا.، شا.) پیـک. تێکوڵـی دارییـە، کـە بـە لوولـە دەربهێـنرێ. چووز، تووڵەی داران. (ئەردە.) خوو، تەرز، شێوە، ڕەفتار. باڵا، بەژن، قەڵافەت، کەلافەت.

**تووزان:** چووزانەوە. خلیسکان.

**تووزانەوە:** زوورانەوە، تەوسانەوە. تام و بۆنی بیبـاری سوور یان چتێکی تیژی دیکەیە، کە بگاتە چاو یا لووت یان زار دەیتۆزێنێتەوە.

**تووزاندنەوە:** چووزاندنەوە.

**تووزانن** (ئەردە.): چووزاندنەوە، کاوانن، چووزاندنەوە، تووزاندنەوە.

**تووزە** (ڕەوا.): تووڵە، (کو.) تووزە.

**تووزرە** (کۆ.): تووڵـە، لکە باریکەکانی مێو و ئیترە.

**تووزک** (زا.): گیای توند.

**تووزکردن:** پەیوەندکردنی درەخت. تۆزکردن. جنێودان.

**تووزم** (ڕۆژ.): خوو، ڕەفتار. بەد ـــ: بەدخوو، بەدڕەفتار.

**تووزیان:** کسپە و تووزانەوە. هەڵخلیسکان.

**تووزیانەوە:** کسپە لێ هاتن و تووزانەوە.

**تووژ** (باک.): تیژ. (ئەردە.) تووێژ.

**تووژاڵ** (ئەردە.): تووێژاڵ.

**تووژک** (باک.): چکۆڵە.

**تووژگ** (ئەردە.): تووێژ. تووژ. (زا.) خەنجەر.

**تووژگ یەخ:** پارچەی سەهۆڵێکە بەسەر ئاوەوەی دەبەستێ.

**تووژماڵ:** بڕوانە: توشماڵ.

**تووژی** (ئەردە.): تورجی، بڵاوکردن.

**تووسوورە:** جوورە توویەکی سووری مزرە.

**تووسی:** تووێسی، تێسوو.

**تووش:** ڕووبەڕوو، دووچار. ـــ بوون: ڕووبەڕوو بوون، گەیشتنە یـەکتری، دەپێشیاچوون، هنگڤین، دووچاری کەسێکی یا چتێکی بوون، تێ ئاڵقان، پێوەبوون، گرفتاربوون. ـــ کردن: ڕووبـەڕوو کـردن، گەیاندنـە یـەکتری، دووچاری چتێکی کردن، پێوەکردن، تێوەدان، گرفتارکردن. ـــ ی یەکتری هـاتن: پێـک گەیشـتن. گیـانداری دڵـڕەق و بـەدخوو و چـەتوون. ـــ ۆن، توندو تیـژ، شیرەت، کولـەش. ڕۆژی ـــ: ڕۆژی سەرماو سۆڵە. ئێسـتری تووش: ئێستری بزۆز. سەخت، دژوار، دژ، گران، گرژ، مۆن، ڕێ و بانی ـــ: ڕێ و بانی سـەخت. تیـرە، خێـڵ، حـاجی دەڵـێ: (لـەتووشی خـۆم بـوو هەرچی تووشی خۆم بوو). لەش، ئەندام، تەن.

**تووشاڵ** (ئەردە.): تووێژاڵ، تووژاڵ.

**تووشامی:** تووی ڕەش و گەورە، گاتوو، تووی سوور. (دەر.) تووێم شامی. شاتوو، تفەڕووەنێ، تووی ڕەش.

**تووشە:** تۆشە.

**تووشەبەرە:** تووشەدان، هەوانە، هەمبانە.

**تووشەڵە:** (هەورا.) زڕتوو. تووی پەیوەند نەکراوە و بەرەکەی ووردە.

**تووشەمی** (باک.): تووی سوور.

**تووشبوون:** گەیشتنی دوو چت بەیەکتری. ڕووبەڕووبوون، دووچـاربوون، گەیشتنە یەکتری، دپێشیاچوون، هنگڤین، تـێ ئاڵقـان، یـەکتر دیـتن، پـەرگمین، پـەرگین، تێـک هەڵـەنگووتن. پێوەبـوون، گرفتـاربوون، دووچاربوون، تێوەچوون. بڕوانە: تووش.

**توشتە** (باک.): گەمەییێکی کوردییە.

**توشتیر:** چوشتیر، بزنی دووساڵە.

**توشتیرزا:** توشتیر، کە زا بێ.

**تووشک** (باد.): تووشکەڵە، کارەمێیە، کە پێی لەساڵی دووەم نابێ. (ئەردە.، دەر.) تۆکڵ. (هەورا.) تووێژ و تۆشکەی برین و سەر و ئیترە. تووژک.

**تووشکردن:** رووبەڕووکردن، گەیاندنە یەکتری، پەرگهاندن. پێوەکردن، تێوەدان، گرفتارکردن، دووچارکردنی کەسێک بە کارەساتێکەوە. بڕوانە: تووش.

**تووشماڵ** (لو.، جا.): تیرەیەکە لە خێڵێکی، (هەر.) جۆم. خاوێن و پاکژ کردنەوە و هیچ بۆ نەهێشتنەوە.

**تووشی:** سەختی، دژی، گرانی، دژواری. (باک.) ـــ بوون: خۆ تێکەڵ بەکاری خەڵکی کردن، خۆ تێهەڵقورتاندن.

**تووشیار:** تووشهاتوو، دووچار، گرفتار. ـــ بوون: گەیشتنە یەکتری، گرفتاربوون.

**توفانە** (ئەردە.): مێشوولە.

**توفە** (ئەردە.): کرێوە.

**توفین:** کرێوەکردن.

**تووقاندن:** تۆقاندن، ترساندن. ترەکاندن، درگادان، تەقین لە ناگریدا.

**تووک** (فە.): تێکوڵی دار و ئیتر. تووکی وورد و سووک، موو. کوتوکوڵکی ئاژاڵ و ماڵات. پرز، پرزە، کوڵک. نزا، داخوازی گەند، ویستی خراو. ـــ لێکردن: پێهەڵکاڵان، سنگ لێکوتان، لە سنگدان. رەوشت و خوو. (زاخ.) تووی خواردنیّ. موو، پۆڕ، پۆرت، پوورت، پەڕ. (رۆژ.) تیتک. قژ. تووکی نەرمی باڵندان، کۆنک، پەڕ، کوونک، ـــ رنینەوە: پەڕتاندن، داڕووتاندن، ئاوە رووتکردن. (ش) بۆ چاو پێ هەڵهێنان دەڵێن تووم (کرکی تووم لە موکریاندا نانووسرێ). رەنگ، تین، هێز، کەیف. بێ ـــ: بێ رەنگ، بێ هێز.

**تووکان** (هەورا.): قرتان.

**تووکاندن** (ئەردە.، هەورا.): قرتاندن. ترووکاندنی هێلکە، جووقاندنی جووجیلە.

**تووکانن:** تووکاندن، شکاندن.

**تووکە:** پرووشەی بارانە، بارانەی وورد.

**تووکەتووک:** باڵندەیێکە دەنگەکەی تووکەتووکە. تۆقە، توکە. پرووشەکردنی بارانەیە، پرووشەپرووش، پرووکەپرووک، تووەتووە، نەرمەبارانە.

**تووکەرک** (خۆ.): تووڕەمەکی.

**تووکەس** (باک.): هیچ کەس.

**تووکەسەر:** کەسێکە بەسەر نانەسەری تووڕەبووبێ. ـــ بوون: تووڕەبوون، تەڵس بوون. ـــ کردن: تەڵسکردن.

**تووکەکردن:** ووردبارین، بارانی وورد بارین، پرووکەکردن، پرووشەکردن.

**تووکەی سمێڵ هاتن:** مەبەس لە دڵخۆشی و بزەگرتنە.

**تووک روون:** بێ خەفەت، دڵنیا، کەیفخۆش. ـــی: بێ خەفەتی، دڵنیایی، کەیفخۆشی.

**تووک رۆیین:** تووک هەڵوەرینی مەخمەر و ئیتر.

**تووک رێزای** (هەورا.): تووک هەڵوەراندن.

**تووک کردن:** پەڕدەرکردنی بێچووە باڵندە. پەڕدەرکردنی پەلەوور، دەرهاتنی پەڕی باڵندە.

**تووکڵ** (گەرد.): تێکوڵ، پودس، تۆک.

**تووکڵەوگرتن:** تێکوڵ لێکردنەوە.

**تووکڵ خشخاش:** کۆکەنار.

**تووکڵ هەنار:** تێکوڵەهەنار.

**تووکڵ هێلکە:** تێکوڵە هێلکە.

**تووکمار** (فە.): کیفی مار، کراسەمارانە.

**تووکن:** کوڵکن، مووداوی، موویین، تووکدار، تیسکن.

**تووکنە:** تووکن، تیسکن. زەرنەقووتە: بێچووی باڵندانە، کە هێشتا تووکی نەکردبێ.

**تووکوڵ** (هەورا.): تێکوڵ.

**تووکوڵ و دارا** (هەورا.): تێکوڵی داری.

**تووڵ** (رۆژ.): نەمام، داری ساوا، توولە، لقی باریکی درەختانە. (باک.) تۆڵە. ـــ کرن: تۆڵەکردنەوە. بەردی لووس. جوورە برنجێکە.

**تووڵ** (هەورا.): شووڵ، شووڵک، شوو، توولەی دار. لکی تازەی باریکی درەختانە. تووڵ: چرپی.

**تووڵاش:** تێکوڵدار.

**تووڵاش:** تووڵاشە، دەمە، برشتە. تەڵاش.

**توولە** (خۆ.): تولە، جوورە سەگێکی گچکەیە. (بار.) بێر، بێرکم، رکە (قەفمز). (فە.) تۆڵکە، نانی حاجی لەگلەگی. توولەی دارەمێو و ئیترە، توولەی برکەی خەیار و ترێزو و شووتی و کاڵەک و شەمامە و کاڵەکە مارانەیە. (باک.) بۆق. (هەورا.) تەرز. خەڵفی یەک ساڵانەی دارانە. ـــ مار: بێچووی مار، (موک.) تیرەمار، (هەو) نەسپەمار، ماری باریک و گچکە.

**توولەزەرە:** گیایەکی هاوینییە بەرێکی سووری خری هەیە.

**توولەک:** نەخۆشییەکە وولاخان باریک و بنێس دەکات. گیاندارێکە تووکی وەری بێ لەبەهارێدا. رێوییەکە تووکی هەڵوەریبێ. (کە.) منداڵێکی دە دووازدە ساڵانەیە چ نێر بێ چ مێ. گەنجی تازە پێگەیشتوو.

**توولەکە:** تۆڵەکە، پەنیرە، پەپەکە، مەلیچکانە.

**توولەک بوون:** وەرینی تووکی رێوی و ئیتر.

**توولەک کردن:** تووک هەڵوەراندنی گیان لەبەران لە بەهارێدا.

**توولەمار:** (موک.) تیرەمار. (هەو.) نەسپەمار. ماری باریک و گچکە.

**توولبڕ:** مەبەس لە کەسێکییە، کە بە چتێکەوە خەریک بێ و کەچی بەدڵ گوێی بۆ چتێکی دی هەڵخستبێ.

**توولکێش:** ڕاکێشانی باسکە مێوانە بەسەر زەویدا و لە هەندێک شوێنانیش بە خۆڵ داپۆشرێ، لەو جێگایانەدا ڕەگ داکوتێ و بڕوێ، ئەوجار ناوەندەکانی ببڕێ تا هەریەکەی ببێتە مێوێکی سەربەخۆ.

**تووڵ هەڵلاجی:** شووڵکی پەڕەکەری، شەفشە.

**توولی** (باک.): ووشتری کوڵکن و تووکن.

**توولی سەوز**: گیایەکی لق لقە بەرێکی دەگرێ وەک گوێز بەڵام درێژکۆڵەیە. بایەف، داری چەقالە.

**توولینە** (هەورا.): (کە.) تولینە. قوولینەیەکە لە شوولی باریک دروستکرابێ. جوورە سەوەتەیەکە لە شوولێ (توولێ) دروستدەکرێ.

**تووم** (باک.): سەکۆ. تۆم، ڕەچەڵەک، زنجیرە، تۆو، بنەچەکە. (ئەردە.، هەورا.) تۆو، تۆم.

**توومانە** (ئەردە.): تەماتە.

**توومار**: تۆمار.

**توومە** (ئەردە.): تۆمە، تووم، دان.

**توومەدان** (ئەردە.): تۆمەدان. توومەدانە، منداڵدان.

**توومەدانە** (ئەردە.): توومەدان، تۆودان.

**توومەز**: تومەز، تومەیژە.

**توومەیژە**: تۆمەڵێ، تومەز.

**تووم بی هەنجیر**: واتای دووەمی (گرنگ) یە.

**تووم پیاز**: تۆ پیواز.

**تووم تەرەتیزە**: تۆ تەرەتیزە.

**تووم شانای**: تۆچاندن.

**تووم قاخلی**: تۆ کاخڵی.

**تووم کوولەکە**: تۆ کوولەکە. کرمی چیکڵدانەیە.

**تووم گوڵ**: تۆ گوڵ.

**توون** (کە.): توونگخانەی گەرماوێ، توونخانە، شوێنێ ئاگر لێ کردنەوەی گەرماوێ. ئەتوون (جەهەنەم). وولاتێکی دوور و سامناک و ئاگرینە. توند، چتی کەسکوون.

**توونا**: تەیوو، تەفروتوونا، دەربەدەر. ئاوارە. ــ چوون: چوونە جەهەنەم، چوونە نەبوون.

**توونابوون**: لەناوچوون، دەربەدەربوون.

**تووناکردن**: لەناوبردن، دەربەدەرکردن، ئاوارەکردن.

**تووناوتوون**: توون بە توون، لەناو چوون. ــ چوون: چوونەنەبوون، لەنێوچوون، مردن، تووکارەساتی لەناوبەربوون. ــ کردن: بردنە نەبوون، لەنێوبردن، مراندن.

**توون بەتوون**: توونا و توون. ــ چوون: لەنێوچوون، چوونەبوون. تووشی کێشە و گێچەڵان هاتن.

**توون بەتوون بردن**: تووناوتوونکردن، بردنەنەبوون، مراندن، لەنێوبردن، تووشی کێشە و رووش و گێچەڵان کردن.

**توونچی**: تونگخانەچی. کەسێکە لە تونگخانەدا ئاگر بکاتەوە.

**توونخانە**: تونگخانە، توونی گەرماوێ.

**تونکە**: پانتۆڵی پاڵەوانان.

**توونگە**: گۆزەیەکی زار و مل باریکە و تەنگە.

**توونی**: (هەو.) تینوو، تێنی.

**توو وەشێن**: تۆوچێن.

**تووهشک** (باک.): تووی ووشک.

**تووی**: توو، بەری دارەتوو.

**تووێ**: تێکوڵی تەنک وەکوو هی پیواز و سیر. قەیاغ، سەرتووێ، تۆ، تووک. لۆ، لۆچ، تووێژ، تۆخ، زیوار، زیواڵ، ناو، نێو، باد، تووێخ. لە ــ ی قەفەزێکدا. بەتووێی کراس. یەکباد.

**تووێتە** (ڕۆژ.): توتەڵە، قامکەچکۆڵە.

**تووێتکە**: دانیشتن، سرەوتن.

**تووێتکەخوواردن**: ئارامگرتن، سرەوتن.

**تووێتکەگرتن**: ئارامگرتن، سرەوتن.

**تووی توو** (باد.): هایهۆ هایهۆ، لەکاتی بڕگەکانی گۆرانی و لاوک و لاوژە و حەیراناندا گووێ ڕاگران دەڵێن: ــ.

**تووێ تووێ**: مانگای پێ بانگ دەکرێ، دەنگێکی وایە لە موکریاندا بە تیپی ئارەوی ولاتینیش نانووسرێ. گۆرانییێکیشە بەدەم ــ وە دەگوترێ لەکاتی مانگا دۆشینێدا، جوورە بالۆرەیەکە. پارچەپارچە، تووێ لەسەر تووێ، لۆ لەسەر لۆ.

**تووێخ**: تووێ، تۆخ، تووێژ، پێستی زۆر تەنک، تۆژی پێست، مردگ.

**توویر** (ڕۆژ.): توور، هەرێم، قۆڵ.

**تووی ڕەش**: تفەرووەنی، گاتوو، شاتوو، تووی سوور، تووشەمبی.

**توویری** (زا.): چەقەڵ.

**توویزم** (ڕۆژ.): قەڵافەت، شکڵ، دیمەن. بەرچاو.

**تووێژ**: تۆژ، تۆژک، تووێلک، تووێ، تێکوڵی تەنک، تفر، تفل، تورشک. تووێژی ماری، کرێژی لەش، تۆشک. تووێژاڵ، تووێخ، مردک. ــ ئاوێژتن: مەرتین. ــ لێ کردنەوە: مەرتاندن. ــ ی ماری: کراسەمارانە، تووێشک. ــ ی سەر برینان: قەبار، قرتماغە. چەوریییەکی تەنکە دەکەوێتە سەرماست و شیر بەهۆی کوڵاندنیانەوە.

**تووێژاڵ** (جا.): تێکوڵی تەنک، تووێژی تەنک. زانیاری کەم.

**تووێژگرتن**: پەیدابوونی تووێژ لەسەر هەندێ چت. گرتنەوەی تووێژی چت.

**تووێسوو**: تێسوو، تووێسی.

**تووسوور**: تفەرووەنی، گاتوو، شاتوو، تووی ڕەش.

**تووێسی**: توویسوو. گیایەکی دڕکاوییە لاسکەکەی بریندارەدەکرێ تا جەوی دەربدات، کە کەتیرەیە.

**تووێشە** (ڕۆژ.): تۆشە.

**تووێشەبەرە**: تۆشەبەرە، تۆشەدان. نانەبەرە.

**تووێشتیر**: چوورێشتیر.

**تووێشک** (ڕۆژ.): گیسکە مێیەکە تەمەنی لە ساڵێکی تێپەڕنەبێ. (هەو.) کرێژ.

**تووێشک**: گیایەکە.

**تووێشکانە** (ڕۆژ.): (ش.) کراسەمارانە، تووێژی ماری، تووێژی هەرچی بێ، تووێژاڵ. جیقنەی شلی مەل و باڵندانە، کە بە خۆیاندا دەفیڕێنن.

**تووێشوو**: تۆشە، تێشوو. خوواردەمەنیەکە، کە ڕێبوار لەگەڵ خۆی ببیا بۆ ڕێگایە.

**تووێشووبەرە:** تێشوودان.

**تووێشوودان:** هەمبانە یا چتێکی ترە، کە تێشووی تێکرێ.

**تووێشووکردن:** دروستکردنی تێشوو. نانخواردنی بەیانی.

**تووێک:** تووێخ، تیکوڵی داروورەخت و خەیار و ترێزو و کاڵەک و چتی تر.

**تووێکردن:** تووێژاڵ تووێژاڵ کردنی گۆشت بۆ برژاندن.

**تووێکڵ:** تووێک، تێکوڵ، پیستی دار و درەخت و چتی تر. دووانی بە ـــ و کاکڵدار: ووتەی بەتیکوڵ و پڕ مەغز.

**تووی کێوی:** توورەمەکی، تفەزڕێ.

**تووێڵ** (ڕۆژ. ، مەن. ، هەورا. ): تەوێڵ، نێو چاوان، ناوچەوان، ناوچاو. تاپوو، سامان و ئاو و زەوییەکە، کە لەپێش میری دەیدا بە کەسێکی، کە لەداهاتی وی گوزەران بکات.

**توویل** (ڕۆژ. ): توولە، نەمام. (بار. ) کۆترەباریکە.

**تووێلاش:** تەلاش.

**تووێڵە:** تەویلە.

**تووێڵبەن** (ئەردە. ): دەسرۆکەیەکە، کە ژنان لەناوچاوانیانی دەبەستن.

**تووێڵدار:** کەسێکە، کە زەوی یا ئاوی لە میری وەرگرتبێ، کە بە داهاتی وی بژی.

**تووێڵک** (موک. ، بابا. ، خۆ. ): تووێژ. تیکوڵ.

**تووێڵک:** دارە زڕتووە و بێ بەرە.

**تووێڵنانە زەوی:** کەوتنە سەرخاک، خاک ماچکردن، کڕنۆش.

**تووێم** (ڕۆژ. ، دەر. ): تۆو.

**تووێم شامی:** تووشامی، تووسوور.

**توووین** (ڕۆژ. ): کز، پەرۆشدار، پەست، ئاوارە، مشەخت.

**تووینین** (دەر. ): تووانین.

**تووی ووشک:** توووهشک.

**تهتافک** (زا. ): نەعنا.

**تهریان** (هەورا. ): تریان.

**تهن** (باک. ): تینوو.

**تهناف** (باک. ): گیایەکە.

**تهنووشک** (باک. ): ئازار و هۆی ئالوو کەوتن.

**تهنوویی** (باک. ): تینوێتی.

**تهنی** (باک. ): تینوو، تینی.

**تهێشت** (زا. ): قاوەڵتوون.

**تهێل** (باک. ): سەرکەو، کەسێکە وەسەر بکەوێ.

**تێ** (باک. ): دێ، دێت. (کرما. ) نۆبەتێ، تا. ناو، نێو، دوڕ، هەندوڕ. تێیکە: لەناویکە، تێکردن: لەناوکردن، تێداهێشتنەوە. زۆر جاریش بەسەری ووشانەوە دەنووسێ: تێکردن، تێخستن، تێڕاکردن، تێوەچوون. (ئەردە. ) نۆبەتێ، یاو. (باک. ) تۆ، ئەتۆ، تە.

**تێ ئاخنین:** تێپەستاوتن، ئاخنینەوە، داگرتن، داگرتنەوە، بەزۆری پڕکردنی توورەکە، جەواڵ یا تەلیس.

**تێ ئالان:** لەدەورە ئالان، لەدەوروبەر پێچ خواردن، دەورەدان: بەنەکە لەلاقی مریشکەکە ئالاوە. ئالانی چتێک، بەنێک یا چتێکی تر لە چتێکی تر. لە گردی چتێکی کۆبوونەوە.

**تێ ئالاندن:** لێ پێچان، لێ ئالاندن، ئالاندن.

**تێ ئاڵقان:** داڵقین، خۆ هەڵاوەسین، تووش بوون، تێگیران، پێوەبوون.

**تێ ئاڵقاندن:** داڵقاندن، هەڵاوەسین، تێ گیراندن، پێوەکردن، لێ قایم کردن.

**تێ ئاوێز:** تێخەر.

**تێ ئاوێژەر:** دەنێوخەر.

**تێ ئاوێژتن:** دەنێوخستن. سەماوەر ـــ : سەماوەر تێخستن، واتا ئاو و ئاوور تێخستن.

**تێ ئاوێژران:** دەنێوخران.

**تێیەربوون:** کار و بەرخ دەست بە مژینی دایکیان کردن. سوواربوونی نێر بۆ مێیەکەی لەکاتی خۆیدا بە تێکڕایی. دەست پێکردن، خەریک بوون. مریشکەکان تێیبەربوون، تێی وورووکان. ئاوور ـــ : گڕگرتن، سووتان.

**تێیەردان:** خەریک کردن، بەگژ یەکتریدا کردن. کار و بەرخ بۆ مژینی دایکیان بەرەڵاکردن. ئاژاڵ لە باغچە بەردان: بەرەڵا و پەرت و بڵاوکردن. بە گژداکردن، ئاوڕپشکردن، هشدان. سەگەکەی لە کاروانەکە بەردا، تاژییەکەی لە کەروێشکەکە بەردا. سووتاندن، گڕدان. ئاگری لە پووشەکە بەردا: سووتاندی. سەگ لە خەڵک بەردان، تاژی لە نێچیر بەردان، تاژی و ئیتر بەرەڵاکردن. پەڕاندنی نێرەیە لە مێ لەکاتی فاڵ و تەگە و کەڵدا.

**تێیەزان:** تێپەڕان.

**تێیەزاندن:** تێپەڕاندن. تەزاندن، بێ هەستکردن، سڕکردن.

**تێیەزین:** تێپەڕین. تەزین، بێ هەست و سڕبوون. سەرما و ژان کارتێکردن.

**تێبڕان:** تێڕاکران: تێڕۆکران، لەنێونران.

**تێبردن:** تێبڕین، لەنێونان، تێڕۆکردن، تێڕاکردن، دەناونان، لە نێونان. نقێم لە ئەنگوستیلەنان، دارێکی میچی شکابێ دارێکی ساغی تری لەتەنیشتی دبڕێ. پترکردنی ووتەیەک یا چەند ووتەیەک لە ناوەڕاستی نووسراوێکیدا.

**تێبڕین:** بەزۆری چتێک لەناو چتێکیتر نان بەتوندی، تێکوتان، تێکوتانن.

**تێبین:** دووربین، کەسێکە لە ئەنجامی کاروبار ووردبێتەوە.

**تێبینی:** دووربینی، (باک. ) پاشەرۆک. ووردبینی لە کاروباراندا. ڕوودەربایستی.

**تێبینین:** دووربینی، تێبینی. سەبارەت: سەبارەت بە فیسارەکەس نەبایە وازم لەمافی خۆم نەدەهێنا.

**تێیەڕ:** ڕابر. ئەو کەسەیە، کە تێدەپەڕێ.

**تێیەڕان:** تێپەڕین.

**تێیەڕاندن:** (باک. ) بووراندن، بۆراندن، دابۆراندن. تێپەزاندن، ڕاشکاندن، بووهووراندن، ڕابواردن، ڕاپەڕاندن، ڕەتکردن، ڕاپەڕاندن و گوێزتنەوەی چتێک یا گیان لەبەرێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەنجامدانی کاروبارێک بە گورجی.

**تێپەڕبوون:** تێپەڕین، ڕابردن، بەسەرچوونی کات و چاخی چتێکی.

**تێپەڕکردن:** تێپەڕاندن، ڕاپەڕاندن، لە ئەندازە دەرچوواندن.

**تێپەڕین:** ڕەتبوون، ڕابردن، ڕابووریین، ڕابران، تێکشان، ویاران، ویەرد، ڕاشکان، بووریین، بۆریین، بۆهارتن، تەوریین، تێپەڕین، لە ئەندازە دەرچوون. دەستدرێژی کردن، شووڵ لێ هەڵکێشان، پێ لە بەڕە تێپەڕاندن.

**تێپەڕیو:** ڕابردوو.

**تێپەستان:** تێ ئاخنران.

**تێ پەستاندن:** تێ ئاخنین.

**تێ پێچان:** چتێک لە چتێکەوە پێچان. هەڵپێچان، تکاکردن.

**تێ پێچاندن:** تێ ئالآندنی چتێک لە چتێکەوە یا کەسێک لە کارێکەوە.

**تێت** (دەر.): تات، تاتەبەرد. (ئەردە.) دێ، دێت. (فە.) هەرکەو، بەردێکی قووڵە ئاوی بارانەی تێدا ڕاوەستێ.

**تێتەقان:** تێتەقین.

**تێتەقاندن:** دەرچوون، هەڵاتن، تەقین، ئاوابوون.

**تێتڕان:** بڕوانە: تێتڕاندن.

**تێتڕاندن:** مەبەس لە زۆر خواردنێیە لە ڕووی سووکییەوە بەکاردەبرێ.

**تێترنجان:** گیرخواردنی چتێک لە شوێنێکی تەنگەبەردا.

**تێترنجاندن:** تێپەستاوتن، بە زۆر چتێک لە تەلیسێک یا چتێکیتر ئاخنین. گیرکردنی چتێک لە چتێکی تەنگەبەردا.

**تێترینجان:** تێترنجان.

**تێترینجاندن:** تێترنجاندن.

**تێتکان:** تکانی شلەمەنییەک بۆ ناو چتێکی هەر لەخۆیەوە.

**تێتکاندن:** تکاندن و تنۆکاندنی شلەمەنییەکی بۆ ناو چتێکی بە دڵۆپە دڵۆپ.

**تێتلێسک:** گیایەکی ئاوی هەمیشە سەوزە گەڵایەکانی وەکوو کەوەری وایە ئاژاڵ دەیخۆن.

**تێچاندن:** (بابا.) تێچەندن. تێکوشین، بۆڵک کردن، دووزمانی کردن لەلای یەکێکی گەورە یا گچکە، بەخراپە لە کەسێکی دوان. چتێکی وورد کەمکەمە لەناو چتێکی شل دەکرێ تا باش تێکەڵ ببێ. ئاردەوا لەسەر ئاگر ئاردەکەی تێ دەچێنرێ.

**تێچەقان:** تێڕاچوون، ڕۆچوون.

**تێچەقاندن:** تێڕاکردن. چتێک لەناو چتێکی ڕاکردن.

**تێچەقێن:** ڕۆچوون، چەقین. لەنێوقوڕێ ڕۆچوون.

**تێچەقین:** تێڕاچوون، تێ هەڵچەقان.

**تێچەقێنەر:** ئەو کەسەی شتێک لە شتێکی بچەقێنێ.

**تێچەندن** (بابا.): تێچاندن، دووزمانی.

**تێچڕان:** کۆبوونەوە و بەسەریەکتریدا کەڵەکە بەستن بەزۆری لە جێگایەکی. زەماوەندی کوردۆی هێندەی خەڵک تێچڕابوو شان دەسوو ا.

**تێچڕاندن:** کۆکردنەوەی گیاندار بەزۆری و نارێکی لە شوێنێکیدا.

**تێچڕژان:** بڕوانە: تێچڕان.

**تێچڕژاندن:** بڕوانە: تێچڕاندن.

**تێچن:** باو، تێر، تێرا.

**تێچوو:** کیفایە.

**تێچوواندن:** لەناونان، تێهەڵچەقاندن، تێڕاکردن، تێڕۆکردن، لەنێونان، لەنێوبردن.

**تێچوون:** ئەو خانووە هەزار دیناری تێچووە، واتا لێی سەرف بووە. شاندانە بەر کارێکی و تەقەلای تەواوکردنی دان بەگەرم و گوڕی. تێڕاچوون، تێڕۆچوون، تێهەڵچەقین، تێوەچوون، بۆ بزمار و دەرزی و سینگ و چتی وا بەکاردەبرێ. تێداچوون، لەناوچوون، تەفروتوونابوون.

**تێچێن:** دووزمان، قسە گێڕەوە، ئاووری بنکایە. نۆیە بڕ لە باراش هاڕینێدا. ـــ ی: دووزمانی. نۆیە بڕی لە باراش هاڕینێدا.

**تێخ:** تیغ.

**تێخران:** خرانەناو.

**تێخزان:** خزان، خزین، داخزان، چوونە ژێر لێفە و ئیدیکەوە. چوونە ناو شوێنێکی تەنگ.

**تێخزاندن:** خزاندن، ترنجاندن، چراندنی چتێک بۆ ناو شوێنێکی تەنگ.

**تێخزێن:** تێخزێنەر.

**تێخزێنەر:** تێخزێن.

**تێخزین:** تێخزان.

**تێخستن:** تێ ئێخستن، چتێک لە چتێکی ترەوە بخرێ و قایم بکرێ: ـــ ی پێدەڵێن، لێ قایم کردن. چتێک لەناو چتێکی ترنان، کە قووڵ بێ، تێ ئاوێژتن، خستنە ئاو. کەسێک تووشی ڕووشە و گێچەڵ و کارەسات کردن. سەماوەر ـــ : ئاو و ئاوور لە سەماوەر کردن، سەماوەر تێئاوێژتن. تووشی زیانکردن. پێ دۆڕاندن: فیسارەکەسم لە قومارێدا تێخست.

**تێخوڕین:** فەرماندان، لێ خوڕین، تێڕاخوڕین، (ئاوێ.) خشا. دەنگدانی گیاندار بۆ ڕۆیشتن و نەڕۆیشتن و کپ و مات بوون. گوڕڕاندن، خوڕین، بەسەردا گوڕڕاندن و فرمان پێکردن.

**تێخونجان:** لەباربوون و گونجانی چتێک لە شوێنێکیدا.

**تێداچوواندن:** پامالکردن، پایە مالکردن. پێچوواندن، مراندن، کوژتن، زیان پێگەیاندن.

**تێداچوون:** لەناوچوون، سەردانان، پایەماڵ و پایەماڵ بوون، پێچوون، پێ مردن، لەنێوچوون، تێچوون، زیانکردن.

**تێدان:** تێ هەڵسوون. تێکردنەوە. کرم ـــ : پەنیر یا گۆشتە، کە کرمی تێداوە. تێڕاکردن، دەرزی لێدان، تێ هەڵچەقاندن. ئەسپێ یا سن لە گەنم و دانەوێڵە کەوتن.

**تێدانەوە:** پارچەیەک خستنە سەرپارچەیەک جل و بەرگ و ئیتر. دووبارە دەست بەچتێک کردنەوە، کە ماوەیەک وازی لێ هێنرابێ.

**تێدە** (باک.): تێدا.

**تێر:** تەسەل، تێروپڕ، سێر، دژی برسی. (سۆ.) بەس، باوی، بای. ـــ بوون: بەس بوون. ـــ اوییە: بۆوی بەسە، باوی ویە، بای ویە. تۆخ، پڕ. ڕەنگێکە تۆخ بێ. مرۆڤی دەوڵەمەند.

**تێڕ:** دوو نیمچە جەواڵی لێکدرووا وە، لەسەر پشتی وولاّخان گلّ و دەغلّ و تەرەکاری و چتی تری پێ دەکێشن. خورجی گەورە، ترابی، هۆڕ، لە خوری و مووی دروستدەکرێ. مەردومی مۆڕ، گرژ، مۆن.

**تێڕابی** (باک.): تێڕ، خورج.

**تێڕابینین:** تێڕادیتن.

**تێڕاچوواندن:** تێ هەڵچەقاندن.

**تێڕاچوون:** تێهەڵچەقان، پێداچوون، تێوەچوون، تێچوون، تێڕۆچوون. دەرزی و درەو بگەنە گۆشتی تێڕادەچن.

**تێڕاخوڕ:** ئەو کەسەی لە کەسێ یان ئاژاڵی ڕادەخوڕێ، واتا بە توندی دەنگی دەدا.

**تێڕاخوڕین:** تێخوڕین، خوڕین، فەرماندن، فەرمان پێکردن.

**تێڕادان:** تێوەردان. ئاو لە قاپ یا لە مەنجەڵ و ئیتر وەردان.

**تێڕادیتن:** تێڕابینین، ڕاپەڕموون، پشت پێبەستن، پشت پێئەسپاردن، پشت پێ ئەستووربوون. دخۆڕادیتن: بەخۆڕاپەڕموون.

**تێڕادیتوو:** تێڕابینرا.

**تێڕاشکاو:** زیان کردوو، زیان چێژتوو. ــ ی: زیانکردن.

**تێڕاڤ** (باک.): تێڕاو.

**تێڕاکران:** تێڕۆکران، تێبڕان، لەنێونران، تێچوون.

**تێڕاکردن:** تێڕۆکردن، تێبردن، تێبڕین، لەنێونان، هەزاندن، تێچوواندن، تێهەڵچەقاندن، ڕاچوواندن.

**تێڕامان:** نۆڕین، تەماشاکردن، مێزەکردن، تێوەڕامان، لێ ووردبوونەوە. دامان، واق ووڕمان.

**تێڕاماو:** بڕوانە: تێڕامان.

**تێڕاو:** تێڕاڤ، بۆت، پاراو. گیاندار یا کشتوکاڵێکە تینوو نەبێ. ــ بوون: پاراوبوون، تێر ئاوخوواردنەوە. ــ کردن: پاراوکردن، تێڕاوکردن، بۆت کرن.

**تێڕاوبوون:** پاراوبوون، ئاو تێر خوواردنەوە.

**تێڕاوی:** تەڕ و پاراوی، دژی تینوێتی.

**تێڕاهێنان:** بەسبوون، تێربوون، تێهەلاّتن.

**تێرەخۆر:** تێرەخۆرە.

**تێرەخۆرە:** ئەوەندەی برسی پێ تێر بێ، جەمی یەک برسی.

**تێرەوەبوون** (ئەردە.): مۆڕبوونەوە.

**تێرباران:** بارانی زۆر.

**تێربال** (باک.): ئارام، هێدی، هێمن. ــ ی: ئارامی، هێدیتی، هێمنی.

**تێربەز:** قەڵەو، بەزدار.

**تێربوون:** تەسەل بوون، نەمانی برسێتی لەسای خوواردنەوە. بێ نیازبوون، ساماندراری.

**تێرتێرە** (هەورا.): قومقومۆکەی گەورە.

**تێرخوواردن:** تێربوون لە خوواردنی خۆراک یا مێوە و تەرەکاری و ئیتر.

**تێرخووێ:** چێشت و چتێکی ترە، کە خووێی تەواوێک تێکرابێ.

**دێردلین** (باک.): هەستی دل.

**تێردۆن** (باک.): چەوور، قەڵەو.

**تێردۆنی:** چەوری، قەڵەوی.

**تێردوهن** (باک.): قەڵەو، چەوور.

**تێرزێلاک** (باک.): خێزەلاّن، زیخەلاّن.

**تێرژان:** ڕژانە ناو شووێنێکی، تێکەڵبوون. داگیرکردن.

**تێرژاندن:** تێرژتن.

**تێرژتن:** دەناوکردنی ووردە.

**تێرشیتی:** پڕگرۆ، پڕخەڵک، جەنجاڵ.

**تێرک:** تێڕ، خورجین.

**تێرکە:** خورجی گەورە.

**تێروو** (بل): چەقەڵ. بە جانەوەری دڕندەی وەکوو شێر و پڵنگ و گورگ و ورچیش دەڵێن. تەروو کووێستانی، تیروی. (بابا.، هەورا.) تەروو. دارێکی جەنگڵییە نیو بەژن بڵند دەبێ گەڵایەکانی وورد و سێ چوکڵن بۆ باڵۆکان زۆر باشە: گۆیا دووای دۆزینەوەی سێ چووار پێیەکی دوور پشتاوپشت بۆی دەچن و حەوت لکی لێدەکەنەوە لە نێو دوو بەردانی دادەنێن، کە ئەوان ووشک بوون باڵۆکەدارەکە باڵۆکەکانی پووچ دەبنەوە سا چ خۆی بیکا یا بەناوی وی بکرێ. بەرەکەشی خڕ و سوور و ووردە. هەرکەسێ ٧ دەنکی قووت بدات تا ٧ ساڵان چاوی نایەشێ. شوولکی لە ملی وولاّخی پسکەدار بکرێ چادەبێتەوە.

**تێرووانین:** تەماشاکردنی چتێک و لێ ووردبوونەوەی.

**تێرو پاراو:** ڕێکخستن و تەختکردنی شووێنی مەرەزەیە بە جوورێکی وا، کە ئاوی لێ نەبێ، شووێنی بەرز و نزمی نەبێ و ئاوبیگرێتەوە.

**تێروپڕ:** تەسەل، تێرو تەسەل، سەرومڕ، بە تەواوی، بە پوختی، بەبێ کەم و کووڕی.

**تێڕۆچوون:** تێڕاچوون، تێچوون، تێهەڵچەقان، تێڕان، دەنێونران.

**تێڕۆکران:** تێڕاکران، تێبڕان، لەنێونران.

**تێڕۆکردن:** تێڕاکردن، تێبردن، لەنێونان، تێنان، تێبڕین، ڕەزگنان، زەلاندن.

**تێڕۆکردن:** تێڕاکردن.

**تیرۆلیمان** (ڕەوا.): سپڵدار، نەخۆشی سپڵی.

**تێڕۆهاتن:** تێوەڕێنان، تێوەڕانین. (ڕۆژ.) پرنەهاتن. گرتن بە پەلاماردان، پڕپێداکردن، نەوین، پردان.

**تێرویی:** تێروو، تەری.

**تێرهەنگ و دەنگ:** بە دەبدەبە، بە شان و شکۆ. (باک.) تێرهەنگ. پڕحشمەت.

**تێری:** تەسەلی. تۆخی هەندێک ڕەنگ.

**تێرێتی:** تێری، تەسەلی.

**تێرێش** (باک.): پرنێش.

**تێز** (باک.): باروتی کوتراو. (ڕەوا.) قەشمەری، گەپ، تەرانە. (ڕۆژ.) تێزە.

**تێزاب:** تیزاو. دەرمانێکی تیژ و شلە بەسەر ئاسنیش داکرێ دەیسووتێنێ.

**تێزان:** خووێن تێزان.

**تێزاو:** تێزاب، تیزاو.

**تێزە:** نووکی چتی تیژ، قوتکە، قیتکاییەکانی ڕووی دیوار و بورجان. کونێکە لەلای پێی هەندێک تفەنگ و دەمانچە بارووتی لەسەر دەکرێ و ئاگری پێوەدەنرێ. ـــ ی تفەنگێ. تێسکە. تیژ. (ڕۆژ.) تیژە. تیژی ڕۆیشتنی گوللە.

**تێزتێزەدان:** پەلەپەلکردن لە یەکێک بۆ کردنی کارێک.

**تێزکە** (ڕۆژ.): تیژە.

**تێژ** (باک.): تەشکەبەرە. تیژ، گورج و گۆڵ، قۆچاغ، تونـد، چاپوک. (ئەردە.) تیژ، بۆ تیغ. (ئەردە.) تیژ بۆ بیبار و سرکە.

**تێژەنگ:** ئاوێکە زۆر خوڕ لەشووێن و جێگایەکیدا بڕژێتە ناو گۆم و شوێنانی نزم و لێژەوە.

**تێژک** (باک.): چکۆڵە، گچکە. بێوەڵەی ساوای درندان.

**تێساوین:** تێ هەڵسوون.

**تێسرەوان:** تێسرمان.

**تێسرەواندن:** تێسرماندن، لێدان بە داری یا بەرد و ئیتر لە پڕرا.

**تێسرمان:** تێسرەوان بەدەست.

**تێسرماندن:** تێسرەواندن.

**تێسکە:** تێزەی تفەنگێ، تێز. کونی خوارەوەی تۆپ و تفەنگییە، کە لەوێوە ئاوور دەدرێن.

**تێسمێرپاگ:** تێکسرماو، تێکسمراو، چووارشانە.

**تێکسمێریان:** تێکسرمان، تیکسمراو.

**تێسوو:** تیسووێ. (خۆ.) دزری. (کۆ.) دزریە. بەتەڕی نێرتکەکەی بخورێ بۆ زگ ئێشە باشە، سەری نێرتکەکەی جەوی دەردەکات لەگەڵ قەندی بە بریان وەردەکرێ گۆشتی زیندووی پێدەهێنێتەوە، بنەکەشی دەکرێتە ئەسپێن.

**تێسوون:** تێهەڵسوون.

**تێسووێ:** تێسوو، تۆوسی، گیایەکی دڕکدارە.

**تێشە:** تەشووێ، تەوشێ.

**تێشت** (باد.): قاوەڵتوون، چێشتان. نانی قاوەڵتوونێ، نانی نیوەڕۆیە.

**تێشتەنگاو:** نانی چێشتەنگاوێ، قاوەڵتوون. کاتی نیوەڕاستی بەیانی و نیوەڕۆیە، چێشتان.

**تێشکان:** زیانکردن، دۆڕاندن، هەڵخەڵەتان.

**تێشکاندن:** زیان پێکردن، پێدۆڕاندن، هەڵخەڵەتاندن.

**تێشکاو:** زیانکردوو، هەڵخەڵەتاو. تێکشکاو، چتێکە بەسەریەکدا شکابێ.

**تێشوو:** تۆشە، زادی ڕێگا، زەواد، توویێشوو. (دزە.) بۆنگ، دەباغ. ئەو دارە ئەوەندەشی ئاو خواردۆتەوە هێشتا تێشووی هەڵنەگرتووە، ئەو منداڵە ئەو هەموو ئاوەشی خواردۆتەوە، کەچی هێشتا تێشووی هەڵنەگرتووە.

**تێشووبەرە:** تێشوودان، تووێشەبەرە.

**تێشوودان:** هەمبانە، تێشووبەرە. چتێکە تێشووی تێبخرێ.

**تێشووکردن:** زاد بۆ ڕێگا و بانان ئامادەکردن. نانخواردنی بەیانی، بەرچایی.

**تێغ:** تیغ، کافرمان، گووێزان. تیغ، کێرد، چەقۆ، خەنجەر، شیر.

**تێغە:** تیغەی دیوار، دیواری تەنک و باریک. دەمەی تیغ، دەمەتیغی تراش. لێچ، کەنار، لێواری حەوز و ئیتر.

**تێغ تێژ:** تیغی تیژ.

**تێفراندن:** فڕاندنی چتێک لەنێو چتێکی تر.

**تێفرێدان:** فڕێدانی چتێک بۆناو چتێکی تر.

**تێڤە** (باک.): وەک هەواڵی خۆی وایە بەلاّن ڕەووشی جیاوازە. دەوێدا، تێدا.

**تێڤل** (ئەپا.): تێکوڵ.

**تێقلپاندن:** قلّپ کردنەوەی شلەمەنیەک بۆناو دەفرێکی تر.

**تێقۆپان:** قۆپان، لاوازبوون، بێ تین و تووان بوون.

**تێقۆپاندن:** قۆپاندن، لاواز و بێ تین کردن.

**تێقۆپاو:** قۆپاو، لەڕ، لاواز، بێ تین.

**تێک:** تەواو، گشتی.

**تێکاوێژتن:** چرپان چرپان، چرپاندن.

**تێکە:** تێ بکە، دەنێوکە، چا یا ئاو یان چتی شل تێکە.

**تێکەر:** ئەوەی تێ دەکا.

**تێکەڵ:** تێکڵ، تەڤل، هوومێن، تێکەلاو، تەڤلهەت، چەند چتێکی، کە تێکەلاّوی یەکتری بووبن. ئاشنا، دۆست، خزم.

**تێکەلاو:** پالۆش، تێکچرژاو، تێکەڵ، ئاوێتە، ئامێتە. ـــ بوون: تێکەڵبوون، جەمجقین. ـــ کردن: جەمجقاندن، بەرناڤدان، هەڵچکاندن. شپرزە، خەوخی. ـــ ی: تێکەڵی. دۆستایەتی، خزمایەتی، هاوالاّیەتی.

**تێکەڵ بوون:** تێوەچوون، تەڤل بوون، ئاوێتەبوونی چەند چتێک بەیەکەوە.

**تێکەڵدان:** تێکهەڵدان.

**تێکەڵکردن:** کەرچلاندن، بەرناڤدان، جەمجقاندن، ئاوێتەکردنی چەند چتێک بەیەکەوە.

**تێکەڵ و پێکەڵ:** نەڤلّدم، (باک.) گێرە ڤێرە. چتی بە یەکاچووی ناڕێک و نالەبار. ـــ بوون: نەهەڤگەتی.

**تێکەڵی:** تیکەلی. ئاوێتەبوون. خزمایەتی، ئاشنایی، هام و شۆکردنی یەکتری.

**تێکەوەپێچان:** وەرپێچان، لوولدان، تێک پێچان، پێچانەوە، تێکەوەدان.

**تێکەوەپێچران:** لوولدران، پێچران.

**تێکەوەدان:** تێکهەلاّوێژتن، چپەچپ. تێکەوەپێچان، تێکڤەدان.

**تێکەوتن:** لەناوکەوتن، کەوتنە ناوچتێکی. مەلەکردن، لەناو ئاودا خۆ شوشتن. زیانکردن، دۆڕاندن، خرچان. تەفرەخواردن، گوڵ خواردن. ڕێکەوتن، خێوان، گونجان. (باک.) مەمک، کنج. ـــ ی ژنان: بێ نوێژییە. ـــ ی پیاوان: مەلەکردن.

**تێکەولێکە:** سەودا. کێشە، کێشەکێش، بێ سەروبەری شووێنێک بە چەشنێکی وا، کە پرسینەوەی تێدا نەبێ.

**تێکبەربوون:** بە گژ یەکتردا چوونی دوو گیاندار یا پتر.

**تێکبەردان:** بەگژ یەکتریدا کردنی دوو گیاندار یا پتر.

**تێک بەزان:** لێک ترازان، لەپاڵ یەکترنران.

**تێکبەزاندن:** لێک ترازاندن.

**تێک بەزین:** لە یەکتری گیربوون، لەنێو یەکتری نران، وەکوو قامکەکانی هەردووک دەستان لەپاڵ یەکتری بنرێن.

**تێکبردن:** تێپەڕاندنی دووچت بەناو یەکتریدا.

**تێکپەڕاندن:** تێکبردنی دوو چتان یا پتر بەناو یەکتریدا و تێکخستنیان.

**تێکچرژان:** تێکەڵاوبوون، کەوتنە نێو یەکتری.

**تێکچرژاندن:** تێکەڵاوکردن.

**تێکچرژاو:** چڕ، چێڕ.

**تێکچوو:** شێواو.

**تێچوواندن:** شێواندن.

**تێکچوون:** خرابوون، ئاڵۆز و ناسازبوون. (باک.) بەقەم. پەرێشان بوون، پەنگخوواردنەوە، ناکۆک بوون، هەرافتن، شێوان، شڵەژان، لۆس بەلۆس، ڕێک و پێکی لەناوچوون. پێ ـــ: چۆرت پارەبوون. دڵ ـــ: دڵ پێکداهاتن. ناکۆکی، شەڕ و کێشە. دوورکەوتنەوە.

**تێکچوونی کاروبار:** (خۆ.) شەپۆپان.

**تێکخران:** دوو یا چەند چتێکە، کە ببرێتەوە ناویەکتری.

**تێکخراو:** دوو یا چەند چتێکە برابنەوە پاڵ یەکتری. تەختەکانی ڕووی ئەو مێزە باش تێکخراوون.

**تێکخستن:** سەری دووچتان لێک قایمکردن، تێک بردنی دوو یا چەند چتێک بەناو یەکتری.

**تێکدان:** خراکرن، دار لەسەر بەرد نەهێشتن، کاولکردن، هەڵوەشاندن. بەرتیل کرن، تێک و پێکدان، کرتووپان، شێواندن، ڕووخاندن. نێوان تێکدان: لێک زوویر و تووڕەکردن.

**تێکدەر:** ئەوەی شت یان نێوانی خەڵک تێک دەدا.

**تێکدران:** بڕوانە: تێکدان.

**تێکڕا:** پێکڕا، بەیەکەوە، سەراپا، سەرپاک، پێکەوە، تەف، (باک.) تەڤ. تەڤدە، دەهەڤ. هەموو، گشت، خڕ. ـــ ی: گشتی، بەگشتی.

**تێکردن:** شەڕ و کێشەکردن. چتێک لەناو چتێکی تر کردن، چا لە ئیستیکان کردن، ئاو لە بەرداخ کردن، گەنم لە جەواڵکردن و هتد. تێکرن. کار و بەرخ لە دایکیان بەردان بۆ مژینی. ئامادەکردن.

**تێکردنەوە:** درێژ یا پانکردنی پارچەیەک لە جل و بەرگ و ئیتر بە خستنەسەری پارچەیەک.

**تێکسرمان:** تێکسرەوان.

**تێکسرماندن:** تێک سرەواندن.

**تێکسرماو:** دوو قوولری، دوو گوردی، کولەبنە، کورت و قەڵەو، قوڵەبنە، پانۆڵە. قەڵەو داڕێژراو. (ڕۆژ.) پانۆڵە.

**تێکسمڕان:** قەڵەوی و داڕێژراوی گیاندار.

**تێکسمڕاو:** گیانداری تێکسرماو.

**تێکشان:** تێپەڕین، ڕابردن بەبێ هەست و خشە.

**تێکشکاندن:** شکاندنی چتێک بەسەر یەکتریدا.

**تێکشکان:** لەنێو یەکتریدا شکان و پارچەکانی تێکەڵ بە یەکتربوون.

**تێکشکاو:** لەنێو یەکتریدا شکاو و پارچەکانی تێکەڵ بە یەکتربووبێ. ـــ ی: لەپاڵ یەکتری داشکان.

**تێکفەدان** (باک.): تێکەوەدان.

**تێک کردنەوە:** پارچەیێک لە پارچەیێکی کورت یا تەسک بکرێتەوە ـــ ی پێدەڵێن.

**تێک گیران:** لێک گیربوونی دوو یا چەند چت لەیەکتری. شەڕ و کێشەیە بە لێکدان یا بە دەمەقاڵە، بەگژ یەکتریداهاتن، بەپیلەهاتن، پیلەبازی، ووشت و مڕ.

**تێکڵ:** تێکەڵ، تێکەڵاو. بەندیوار. ـــ ی: بەندیواری.

**تێکڵهەڤ** (باک.): تێکەڵاو.

**تێکنان:** لەپاڵ یەکتری نان.

**تێکنانەوە:** لەپاڵ یەکتری نانەوە. کاتژمێر و ڕادیۆ و ئیتر هەڵوەشاندن و لەشوێنی خۆیان نانەوە.

**تێکوەرانێ:** (گەلاڵە، ڕەوا، سوور، هەر.) زۆرەوانی، زۆرەبانی. ـــ کردن: زۆرەوانی گرتن.

**تێکوەردان:** تێوەردان، (هەورا.) چەنەوەردای. گرژاندن.

**تێک و پەکان:** کاول بوون.

**تێک و پەکاندن:** وێران و کاولکردن. تێکدان.

**تێکوتان:** کوتان، چتێک بە شوێنێکیدا بردن بەنهێمی، تێبرین.

**تێکەتاندن:** تێکوتان.

**تێکوتانن:** تێکوتان.

**تێکوتیان** (ئەردە.): تێبران، تێبریان.

**تێکورانە** (خۆ.): زۆرەوانی.

**تێکۆشان:** تێکۆشین.

**تێکۆشەر:** هەوڵدەر، خەباتکار.

**تێکۆشی:** هەوڵ و پەلە بۆ چتێک.

**تێکۆشین:** هەوڵدان، تەقەلادان، کۆشین، خەباتکردن، شان دانەبەر، (هەورا.) ووڵابین. زۆر ـــ: حەشرکردن. هەوڵدان. نان لە شۆرباوێ کوشین، تریت کردن. (هەورا.) دەیۆلایین. تێچاندن، دووزمانی، زمان لێدان. لە ئەندازەبەدەر پارە بەخت کردن.

**تێکوشیو:** تریت، تلیت، نانی لە شۆرباو کوشراو.

**تێکوڵ:** تێقڵ، شکوولک، شکەلووک، تفل، تۆفر، توول، تفر، پەلک، تووێلک، توویلک، تۆخ، تۆکل، تووێ، قاپێلک، قپێلک، ئەشکیلۆک. ـــ برنج وگەنم و جۆ: سفی. ـــ ی زۆر ناسک و تەنک: کەن، کەند. ـــ ی داران: قاشوولک، قالووشک، قلاش، لیل. ـــ ی هێلکە: قەپێلک. ـــ لێ کردنەوە: کەلبتین، کەلبتاندن.

**تێکهەژیان:** لێک ئالان بە جوولانەوە.

**تێکهەلاویژتن:** چپەچپ، چرپەچرپ، تێکەوەدان، هاتوو چۆیەکی ناڕێک و ناهەموار.

**تێکهەڵەنگووتن:** تووشی یەکتر هاتن.

**تێکهەڵچوون:** بەگژ یەکتریداچوون، بەرەنگاری یەکتربوون.

**تێکهەڵدان:** دوو یا چەند کەس بە شەق تێک هەڵبدەن. تێکەڵ کردنی گەنم و جۆ بۆ باراش.

**تێکهەڵشێلان:** شێلانی چەند چتێک بەسەر یەکتریدا.

**تێگەڕان:** گەرما یا دووکەڵ یا سەرما لە ژووری بەناو ماڵێدا گەڕان. پشکنین.

**تێگەیاندن:** ئاگاداركردن، تێگەیاندن، حاڵی کردن. خۆ ـــ: ناووڕلێدانەوە و غەم لێ خواردن. خۆتێ نەگەیاندن: خستنە پشت گووێ.

**تێگەیشتن:** تێ گەیشتن، حاڵی بوون، سەر لێدەرکردن، سەرلێدەرچوون، تێگەیین، ئاقسین.

**تێگەیشتوو:** بەهۆش، هۆشدار. (باک.) بیربڕ. بیرەوەر، هۆشمەند، هۆشیار. زیرەک و ژیر. تێنەگەیشتوو: پاتاڵ.

**تێگەیین:** تێگەیشتن.

**تێگەییو:** تێگەیشتوو.

**تێگرا:** تێکرا. ـــ یی: تێکرایی.

**تێگرتن:** دەنێوگرتن، لەنێونان. چوارچێوە لەدیوارگرتن. سەر لەخەنەگرتن، وێنە لەچوارچێوەگرتن، نیوەنمەک و ئیتر لە ئەندام گرتن و هتد. هاوێژتنی چتێک بۆ چتێکی تر.

**تێگرماندن:** تووڕەبوون لە یەکێکی و هەڵشاخان بەسەریدا.

**تێگل** (باک.): شلووێ، لێڵ.

**تێگوشین:** تێکوشین.

**تێگهاندن** (باک.): تێگەیاندن.

**تێگران:** تێ ئاڵقان، پێوەبوون، تووش بوون، گرفتاربوون.

**تێگراندن:** تێ ئاڵقاندن.

**تێگریان:** تێگیران.

**تێگریاندن:** تێگیراندن.

**تێگوشین:** تێکوشین. نان لە شۆرباو کوشین واتا ووردکردن و لەناو شۆرباو کردن تا بیێتە تلێت. بۆ لێدان، چاڵ بۆ هەڵکەندن.

**تێگیران:** دووچاربوون، پێوەبوون، زۆر بۆهاتن، تووشی دەمەقاڵە و یا شەڕ و یان کێشە و ڕووشەهاتن. تێ گیریان، چتێک لەنێو چتێکی تر گیرکران.

**تێگیرکردن:** گیرکردنی چتێک لە چتێک، تووشکردن، دووچارکردن.

**تێگریان:** تێگیران، تەنگانە.

**تێگسمران:** تێکسرمان.

**تێگسمراندن:** تێکسرماندن.

**تێگسمراو:** تێکسرماو.

**تێل:** تەل، (دەر.) تاڵ، سیم.

**تێلا:** کوتەک، داردەستێکی ئەستوورە. تەیاخ، پەیاخ. بەرچیغ، بەرچیغ. باسکەدارێکە وەبەر سەربان یا دیواری شکست دەدرێ، دیرەک، بەرچیغ، ئەستوندەی خیوەت و ئیترە. (خۆ.، دزە.) کوتکی جل شووشتنییە. داردەستی ئەستوور. (خۆ.) چەڵاکی میوە لێکردنەوە.

**تێلاترپێن:** مەبەس لە لێدانی یەکێکییە بەدار و بەزۆری.

**تێلاو:** تالاو.

**تێلایی** (دەر.): تالایی.

**تێلە:** تیل.

**تێلەکە:** کۆڵێکی بەستراو و ئامادەیە بۆ ئەوەی بەکۆڵ هەڵبگیرێ.

**تێلەکەکێش:** کۆڵکێش، پشتی کێش، کۆڵهەڵگر.

**تێلەگە:** کۆڵ، تل، پشتی.

**تێلخانە:** برووسکەخانە.

**تێلک** (باک.): تێلی گچکە.

**تێلی:** نێوی پیاوانە.

**تێلی بسکان:** داو، هەودا، تاڵ.

**تێلی دڕواوی:** تەلی دڕکاوی.

**تێلمان** (موک.): دامان، سەرگەردان بوون، پەک کەوتن.

**تێلماو** (موک.): داماو، لێقەوماو، تەنگاو.

**تێمرووکان:** تێوەرووکان.

**تێمیسک:** (رۆژ.) تامیزک. (شا.) تامیسک. (زەن.، هەورا.) تەنخالە. (کە.، جبا.) خەمیازە.

**تێن:** تین، هێز.

**تێنان:** دەنێونان، تێڕۆکردن، تێ نهاندن، تێخستن، تێ ئاوێژتن، هرزاندن، چتێک لەنێو چتێک نان.

**تێنە** (فە.): تانووت. ـــ دان: تانووت لێدان.

**تێنەوبن:** دەستدانە چتێکی قورس بۆ هەڵگرتنی یا هەڵکەندنی بە نهێم.

**تێنگ** (فە.): تینوو.

**تێنووارین:** تیرووانین.

**تێنی** (باک.): تینوو، توونی.

**تێنیشتن:** لە کارێکەوەچوون، خەریک بوون. شاندانە بەر فەرمانێکەوە.

**تێواندنەوە** (بال.، دەر.): تواندنەوە.

**تێوەپێچان:** هەڵپێچان، تەنگاوکردن. چتێک لە چتێکی ترەوە پێچان، بەدەمەوەدانی کەسێکی لەکارێکی خراپدا.

**تێوەچوون:** تێوەگلان، تێڕابوون، پێوەچوون، کۆپیان. دەست پێکردن، خۆلەبەرنان، شاندانەبەر کارێکی بۆ کردنی. دەنێوەوە چوون، تێوەگلان، دەسرەکە لە ڕزنەکەوە چوو.

**تێوەدان:** (هەورا.) پەینەشدان. هەویرەکە شلە کەمێک ئاردی تێوەدە. تێهەڵسوون. کەدەستت سووتا ماستی تێهەڵسوو. ئاوێتەکردن. زمان لێدان، بەدناوکردن، لای میری فیسارەکەسی بێتاوان تێوەمەدە.

**تێوەڕ:** لات، ڕاز، گەوەڕ. ڕێزە شاخێکە، کە کورت و نزم بن.

**تێوەراتن:** تێوەرێنان، تێوەرهێنان، ئامێز لەچتێکەوە وەرهێنان.

تێوورووکان. تێڕۆهاتن.

**تێوەڕامان:** تێڕامان، لێ ڕامان.

**تێوەڕاماندن:** تێڕاماندن، لێ ڕاماندن.

**تێوەردان:** تێک وەردان، شێواندن. (هەورا.) چەنەوەردای. ئاو لە زار یا لە قاپ و دەفر وەردان بۆ خاوێنکردنەوەی. هێنانەوەی دۆ لەسەر ئاگر تا دێتە کوڵ بۆ ئەوەی نەبزرکێ تا بیکەنە چێشتی دۆکولێو.

**تێوەڕووژاندن:** تێوەڕووژان، هەرەوەزی، گەلەکۆمەگی. تێووڕووکان و لەگردی چتێ یا کەسێ کۆبوونەوە بۆ تەماشا یا شەڕ یا یاریکاری.

**تێوەڕووکان:** تێوەڕووژان، هورووژان، وورووژان، لەدەورە کۆبوونەوە، دەورەدان، تێوەڕاتن.

**تێوەڕووکاندن:** تێ بەردان. خەریک کردن.

**تێوەڕهاتن:** داوەڕووکان.

**تێوەڕهێنان:** ئامێز لە چتێکەوە وەرهێنان، تێوەڕێنان.

**تێوەڕێخ:** ئەو داوەیە، کە جۆلاّیان دەیهێنن و دەیبەن و دەیتەنن.

**تێوەڕێنان:** ئامێز لە چتێکییەوە وەرهێنان، تێوەڕهێنان.

**تێوەڕینان** (هەورا.): ڕشتن، چاوڕشتن، دەرمان لەچاوکێشان.

**تێوەژاندن:** (هەورا.) مەژەند، جۆلەزمە. ــ ی کەر: نەقیزە لێدان. ــ ی مرۆ: نقوورچ لێدان. ــ ی تەندوور: کۆلۆوەژ لەنێو تەندووری وەردان.

**تێوەژاندن:** نەقیزە لە گاجووت یا گوێدرێژان دان تا خێرا بڕۆن. ئاگادارکردنەوەی کەسێکی بەدەست یا بە چتێکی تر.

**تێوەژەندن:** تێوەژاندن.

**تێوەشاندن:** داوەشاندنی جلکی دژوێن لە تەندووری گەرمدا تا مۆرانەکانی بکەونە ناو تەندوورەکەوە.

**تێوەشان:** تێوەشاندن.

**تێوەشیان** (ئەردە.): لێ وەشیان، سەرگەرم بوون. لە کارەوەچوون.

**تێوەگلان:** تێوەچوون، دووچاربوونی کەسێک بەکارێکەوە، کە پێی خۆشنەبێ، ئەم ساڵ بە تووتن کرینەوە تێوەگلاووم. تێوە چوونی چتێک لە چتێکی شلەوە.

**تێوەگلاندن:** دووچارکردنی کەسێک بەکارێکەوە، کە حەزی لێنەکات. چتێک لە شلەمەنیەکەوەدان.

**تێوور** (تێویر): ڕێ، ڕا، بیروباوەڕ.

**تێووڕووژان:** تێوەڕووژان گەلەکۆمەگی، هەرەوەز بۆ تەماشا یا یارمەتی لە کاروباردا و یان بۆ شەڕ.

**تێووڕووکان:** تێوەڕووکان، کۆبوونەوەی چەند گیانداریک لە چتێک.

**تێووڕووکاندن:** تێوەڕووکاندن.

**تێوریخ:** بۆ حەسیر و پەرژین و قەرتاڵە و بەڕە و مافووره دەبێ، کە لەنێوانی لکەکان هەڵدەکێشرێ.

**تێووشین:** تێکوشین.

**تێووڵ** (دەل.، فە.): نێوچاوان.

**تێووڵە** (ئەردە.): تەویلە.

**تێوولین:** تێکوشین.

**تێویر:** ڕێ، ڕا، بیروڕا، بیروباوەڕ.

**تێوێڵ:** نێوچاوان.

**تێهاتن:** چوونی چتێک بۆ ناو چتێکی تر، حەوزەکە ئاوی تێهات. داهاتن و هەڵمەتدانی چتێک بۆ چتێک.

**تێهاتین:** تێهێنانەوە، ئەمەگداری، سەربڵندی، سەرکەوتنی یەکێک لە کارێکیدا.

**تێهەلاتن** (موک.): لە ئاوێدا مەلەکردن.

**تێهەڵەنگووتن:** هەڵەنگووتن، هنگڤین.

**تێهەڵچەقان:** تێ هەڵچەقین.

**تێهەڵچەقاندن:** تێڕاکردن، تێچوواندن، تێڕۆکردن، پێداچوواندن، ڕاچووواندن.

**تێهەڵچەقین:** تێچوون، تێڕاکران، تێڕۆکران، هەڵچەقان، ڕاچوون، تێ هەڵچەقان، تێڕاچوونی چتێکی تیژی وەکوو دەرزی و درووو و ئیتر لە لەش یا لە چتێکی تردا.

**تێهەڵچو:** کەسێکە بەبێ بیرکردنەوە پەلاماری هەموو کارێکی بدات.

**تێهەڵچوون:** پەلاماردان و باوەش کردن بەکارێکیدا. تووڕەبوون، تێخوڕین.

**تێهەڵچوونەوە:** پەشیمانبوونەوە، بادانەوە، دەست پێکردنەوە.

**تێهەڵدان:** شەق لێدان، بەشەقی لە چتێکیدان، بەشەقی لە کەسێکیدان. تووڕهەڵدان، فڕێدان. تێکەڵکردن، برنجەکە هەڕشتەی تێهەڵدە. ئاو لەناو دەفری کردن. ئاوپێداهاتن.

**تێهەڵدە:** دەری کە.

**تێهەڵساوین:** تێهەڵسوون.

**تێهەڵسووان:** مەقلین، سوونی چتێک لە چتێکی تر.

**تێهەڵسوون:** لێ هەڵسوون، سووین، لێ سوون، ڕۆن لەنانی هەڵسوون، مەقلاندن. خۆتێ ــ: خۆتێهەڵقوتاندن، پەشتەپەشت کردن.

**تێهەڵقوتاندن:** نافتووش. خۆ ــ: پەشتەپەشت کردن، مرووموووشکردن، خۆکردنە پلەندەر.

**تێهەڵقوتێن:** لاپرسەنی، مرووموووشکەر.

**تێهەڵقورتان:** لە خۆوە خۆ لە کاروباری ئەم و ئەوەوە دان. تێهەڵقوتان.

**تێهەڵقورتاندن:** تێهەڵقوتاندن. خۆ لە کاروباری ئەم و ئەوەوە دان.

**تێهەڵکردن:** گۆرانی ــ: بەدەنگی بڵند گۆرانی گوتن، دەنگ بەرزکردنەوە لە گۆرانیدا، گۆرانی گوتن. تێهەڵچوون لە قسە یا لەکردەوەیەک بەبێ پرس و ڕا.

**تێهەڵکێش:** (هەورا.) هۆرکێشتە. ئەو کەسەیە چتێکی بەناو چتێکی تردا هەڵبکێشێ.

**تێهەڵکێشان:** تێهەڵکێشکردن. تێهەڵێنان، دەشاو هەڵکێشان. دەزوو لە دەرزی هەڵکێشان، پێوەکردن.

**تێهەڵکێلان:** زماندرێژی کردن.

**تێهەڵمان:** سەرەوژوور تەماشاکردن، بەرەوژوور تەماشاکردن.

**تێهەڵنگان:** تێهەڵەنگووتن.

**تێهەڵێنان:** تێهەڵکێشان لە ئاودا. بەس بوون، تێڕاهێنان، بایی بوون. زیان پڕکردنەوە، چاکەدانەوە.

**تێهەڵێنانەوە:** تێهێنانەوە.

**تێهن** (باک.): تینوو.

**تێهناڤک** (باک.): گیایەکە دەخورێ، ناوەکەشی دەدرێ بەو کەسەی، کە خۆربردبێتی (تاوانگاز بووبێ).

**تێهنی** (باد.): تینوو. ــ بوون: تینوو بوون.

**تێنی بوون:** تینوو بوون.

**تێهنی کرن:** تینووکردن.

**تێهنان:** تێهەڵهێنانەوە، تێهانین.

**تێهێنانەوە:** تێهەڵێنانەوە، تۆڵەدانەوە.

**تێ ی؟:** تێیت؟

**تێیت؟:** دێی، دێیت؟. ئایا دێی؟.

**تی** (یەز.): تۆ، ئەتۆ. مرازێکە ببێتە پاشکۆی هەر ووشە یا ناوێکی واتایەکەی دەکاتە چاوگە وەکوو: ئازایەتی، نەبەزێتی، پیاگەتی. (بل.، باک.، بار.) ژنی برای مێردیە. (باد.) توو (بەری دارە توو). (خۆ.، رەوا.) لا، کەنار، رۆخ، لێوار، قەراخ. لای تەسکی و باریکی دەست و ئیدیکەیە. (رۆژ.) (زاراوەی مندالانیشە) ئەوەتا، ئەتا، ئەتانێ. (باد.) تیشک. (باک.) خراپ، بلێ (بۆ میوە). تەنک، تیوار. (باک.) تینوو.

**تیا** (دێرسم): تۆ، ئەتۆ (بۆ مێینانە). (باک.) حەیف، موخابن، پەرۆش.

**تیابردن:** لەناوبردن.

**تیاچوون:** لەناوچوون، یا تووشی زیان بوونی یەکێک لە پێناوی کارێکیدا.

**تیاراماں:** سەرسام مان لە کارێکیدا.

**تیامان:** تێدارامان.

**تیان** (جا.): مەنجەڵی زۆر گەورەیە وەکوو هی هەڵواساز و گەرماوێ. تیانە. (موک.) تیانی گەرماوێ، حەوزی ناوی گەرمی گەرماوێ، خەزێنەی گەرماوێ.

**تیانە:** (جا.) مەنجەڵی گەورە. (هەورا.) قاپ، ئامان. (موک.) مەنجەڵۆک، مەنجەڵی گچکە. تیان.

**تیانچە:** مەنجەڵۆکە، دیزەی گچکە.

**تیانچکە:** تیانچە.

**تیەن:** بارست، بارستا، (هەورا.) بارسا. قەبارە، ئەندازە.

**تیبت:** لەقە، لووشکە.

**تیپ:** سەمەر، دەستە سووارێک. چین، دەستە. (باک.) پیت.

**تیپ:** ڕێز، ڕیز، سان، ڕێزی لەشکر. پۆل، گەل. دەستە، کۆمەڵە، دەستە سوپایەک.

**تیپەن:** کۆمەڵێک لە سووار.

**تیت:** (هەورا.) پرچ، تیتک، قژ، کەزی، پەلکە. (باک.) لاواز، بێ توک، بێ تین. (فە.) تووی داروباران.

**تیتار** (دزە.، خۆ.): تەشقەڵە، قەشمەری. لاسایی.

**تیتاڵ** (سن.، سەقز.): تەشقەڵە، قەشمەری، لاسایی، فڕوفێڵ، گاڵتە، فشە، شۆخی.

**تیتاڵباز:** گاڵتەچی، تەشقەڵەباز، لەودە.

**تیتالک** (باک.): قوللەی کێوی. کۆنگرە و بورجی شەڕێ.

**تیتاڵی** (سن.، سەقز.): قەشمەری، گەمە، لاسایی، گاڵتەکردن.

**تیتە** (ئەردە.): خشڵ، چەکی ژنان.

**تیتڕواز:** تیتڕواسک.

**تیتڕوازک** (ڕەوا.): تیتڕواسک.

**تیتڕواسک** (شا.، هەو.، دەر.): (ڕەوا.) تیتڕوازک. باڵندەییێکی لاق درێژە بەلام لەهی شەلاقەی کورتترە لەشی وەکوو کۆتری وایە ڕەنگی بۆر و سپییە و سەرباڵی ڕەشە، تیتڕواز، تیتڵەپیچاخ، زیقاولە، تووتڕواسک.

**تیتری سماق نانی گەرم** (هەو.): گەمەیەکی کچانە.

**تیتک:** (ڕۆژ.) تووک، قژ، موو، ئەگریجە. (باک.) تۆدان، گەرای مریشک و ماسی و تیتر. (بالە.، ڕۆژ.) پور، پلک، خوشکی باوک. تووتکەسەگ. (لو.) نوشتوو و موورووی ناوچاوانی مندال. (باک.) قازەلاخ، تیتل. (باک.) تیتی. (شار.، سیی.) ئەگریجە.

**تیتکە:** پارچە.

**تیتک زا:** پوورزا.

**تیتل** (باک.): قازەلاخ.

**تیتڵە:** تیتۆڵ.

**تیتڵەپیچاخ:** بڕوانە: تیتلە پیچاخ.

**تیتلەپیچاخ:** زیقاولە، تیتڕواسک.

**تیتل و بیبل:** تیتیل و بیبیل، تیتی نێرە، بیبی مێیە لە هەویر یا لە قوڕی ئابیدە دروست دەکەن. چیرۆکێکی خۆشیشیان بۆ ڕیک خستووە.

**تیتلیسک:** گیایەکی سەوزی ئاوییە گەڵای وەکوو کەوەری وایە.

**تیتن** (باد.): توورتن.

**تیتوو:** (باک.) شێلم. شڕوشڕۆڵ. (موک.) تیتۆڵ، پارچە.

**تیتووتیتوو** (موک.): تیتۆڵ تیتۆڵ، پارچەپارچە.

**تیتۆڵ** (موک.): جل و بەرگ و کاڵا و چتمەک و پەڕۆی شڕ و وورد و کۆن و ڕزیو، پارچە، تیتڵە، تیتوو، ڕنەۆڵ، پڕچک، پرتۆک، تێتڵە، تیتوو، پرتاڵ، پرتۆڵ، تڵیش.

**تیتۆڵ تیتۆڵ** (موک.): تیتوو تیتوو، پارچەپارچە، تڵیش تڵیش، ڕنەۆڵ ڕنەۆڵ، پرتۆڵ پرتۆڵ.

**تیتی:** دەنگی بلوێر و دووزەلە و شێپوور و نێترە. (باد.) سۆفیلکە (باڵندەییێکە)، دەنگی جوورە چۆلەکەیەکییە هەمیشە دەڵێ: تی تی. ووشەیەکە بزنی پێ بانگ دەکرێ.

**تیتێک:** بڕوانە: تیتی.

**تیتیلەوبیبیلە:** بێچوولەی ووردی گیاندار. چیرۆکی بزنۆکە و مەڕۆکە، کە بۆ مندالان دەکرێ.

**تیتیلیسک** (شا.): گیایەکە.

**تیجیاروەری** (هەورا.): تیشکی هەتاو.

**تیجیاری** (هەورا.): تیشک.

**تیخ:** تیغ.

**تیخبەند:** تیغبەند.

**تیر:** (هەورا.) خەست، پەیت، پەرەنگ. مرازێکی ڕاست و درێژە سەرێکی تیژە. تیری کەوانەیە، کە دەهاوێژرێ. ڤزک، قوولک، بەشت، تەخش. ــ ئاوێژتن: تیرەندازی. ــ ە کە باوێ، باوێژە، گوللە. (باک.) توند، پەیت، خەست، واژی شل. (ئەردە.) قەد، بەژن، بالاّ، تووز. (دەر.) تێر، تەسەل. مانگی پاییزییە. (باک.) ئەستوو. پارچە زەوی، پارچە خاکێک.

**تیڕ:** (ئەردە.) چێڕ، مۆڕ. ــ کردنەوە: بە گۆشەی چاو تەماشا کردن. چەند جۆگەیەکی باریکی ڕاستە بەناو مەرەزەدا دەبڕێ بۆ ئاودانی.

**تیڕ** (باک.): دەنگی بۆڕی ئۆتۆمبیلییە.

**تیراوە:** تیراوێ.

**تیراوێ:** کولکێکی پیسی بێ گڕیە لەسەر ئێسک و یا لەنێو گەروو دێت و چابوونەوەی بۆ نیە، تیراوە، کە سارێژیش بێ هەر هەڵدەداتەوە. ئاوارەی مێخەک (جەوهەری قەنەفل) ی لەنێو برینی تیراوێ بکرێ تا چەندین جاران دوایە تا چەند مانگێکی وازی لێ دەهێنرێ ئێسکی ڕزیوی لێ جووێ دەبێتەوەو دەبێ دەربهێنرێ.

**تیراوێژ:** تیرەنداز، تیرەناز. ئەوکەسەیە، کە تیری باوێ و شارەزای تیر ئاوێژتن بێ. ماوە و ئەندازەییەکە، لە تیرئاوێژرا تا ئەو شوێنەی، کە تیرەکەی دەگاتێ و لێی دەکەوێ. ــ ی: تیراوێژتن.

**تیرە** (مەرک.): سەری دێراوانە. مرازێکی چیکەنەیە. لکی هۆز و خێڵێکییە، جەم، تووشماڵ، بابک، باڤک، بنەماڵ، زۆم، بەرەباب. ڕەگەز، جووم، قۆل. تیرەی کەلاّش، سیرمە، زوویل، زۆڵە چەرمێکی خاوی باریک و درێژ هەڵێنراوە بۆ ڕایەڵ و پلیتەی ژێرکەلاّشی. کندراز. تەختەتیرە، تەختەساف. پەلاماردانی بەراز بۆ سەرمرۆ.

**تێرە** (ئەردە.): برووسکە و چەخماخەی ئێشی لەش.

**تیرە ئێستەمێو** (هەورا.): ڕەگەز دۆستی.

**تیرەباران:** (باک.) تیرباران. بە تیر یا بە تفەنگ و چەکی تر دەستڕێژی نیشانە بکرێ.

**تیرەچا** (ئەردە.): چالاوێکی ڕاست و قووڵە.

**تیرەژ** (باک.): تیشک.

**تیرەژە** (باک.): کۆڵکە زێڕینە.

**تیرەشان:** تیغەی شان. درێژایی سەر پۆپەی گرد و شاخ وکێو و کەژانە. شانە هەنگوینێکە هەنگ لەسەر هەڵیبەستێ.

**تیرەغە:** بڕبڕەی پشتێ.

**تیرەقە:** تیرەغە.

**تیرەقەی پشتی** (کۆ.، دەر.، خۆ.): بڕبڕەی پشتێ.

**تیرەگ:** گوڵتە، پاڵەوانە. تیرەک. کۆڵەکەیەکە وەبەر سەربانی شکستە و دیواری شکستی دەدەن.

**تیرەمار:** جوورە مارێکی زەردی باریک و تیژڕەوە لە خۆ ئاوێژتندا توند و چالاکە، توولەمار، ئەسپە مارێکی باریکە و سەری بادامییە خۆ بە هەر چیدا بدا کونی دەکات.

**تیرەناز:** تیرەنداز، تیراوێژ. تفەنگچی. ــ ی: تیرەندازی، تیرئاوێژتن. تفەنگچێتی.

**تیرەنان** (هەورا.): تیرۆک. نانی تیری.

**تیرەنداز:** تیرەناز، تیراوێژ و کەسێکە بزانێ تیری باوێ، تیرئەنداز. ــ ی: تیرەنازی، تیرئاوێژتن، تیرئەندازی.

**تیرەوبوون** (ئەردە.): مۆڕبوونەوە، چیرەبوون.

**تیرەوکردن** (ئەردە.): مۆڕکردن، چیرەکردن.

**تیرەهێش:** تیرهیش، دارهێش.

**تیرباران:** تیرەباران.

**تیربەتیر** (ئەردە.): ڕووبەڕوو، بەرانبەر.

**تیرتیرک** (باک.): سیسرە، سیسرک.

**تیردان:** کێشک، وەکوو فیشەکدان چتێکە تیری تێدا هەڵدەگیرێ.

**تیرک:** (باد.، باک.) تیرۆک. بۆڕی پوولەی ئاسن. مۆدنە، دارجغارە. (ئەردە.) دیرەک، گوڵتە، تیرەک.

**تیرکەتفەنگ:** شیشەییەکی درێژە پەڕۆی لەسەرێکی دەخرێ لوولەی تفەنگی پێ خاوێن دەکرێتەوە.

**تیرکردن:** (ئەردە.) هاندان، فیتدان. (هەورا.) باوێ، بهاوێ، باوێژە.

**تیرکێش** (ئەردە.): تیردان.

**تیرمار** (باک.): ماری بێ ژەهر، تیرەمار.

**تیرمە** (باک.، باد.): گەلاوێژ، سەریسانگ، ناوی مانگی حەوتەمە.

**تیرنج** (ئەردە.): بن باغەڵ.

**تیرۆچک:** فیچقە، فیشقە. بەتیژی و خوڕی فرکەکردنی ئاو یا خوێن. ــ کردن: فیچقەکردن، فیشقەبەستن.

**تیرۆژ** (باد.): تیرۆش، تیشکی ڕۆژ، کە لە ڕۆچنەوە بێتە ژوورەوە.

**تیرۆژوو:** تیرێژوو.

**تیرۆک:** (باد.) تیرک. تیرەنان، نێرەمان، دارێکی خڕ و درێژە و لە قامکی ئەستوورترە ئەنگوتکی هەویری پێ پاندەکرێتەوە.

**تیروکەوان:** تیر بە کەوانەوە، تیروکەمان.

**تیرۆکێ** (کۆ.): جوورە ماسییەکە.

**تیرۆگێ:** جوورە ماسییەکە وەتیرۆکی دەچێ.

**تیرۆمازێ** (هەورا.): کارێتەی پشتێ، بڕبڕەی پشت.

**تیروو:** جوورە دارێکی دێمییە وەکوو تەروو لەشاخی دەڕوێ و زۆر گەورە نابێ. حیز.

**تێرووچانک** (باد.): زۆرانێ، زۆرەوانێ.

**تێرووێ** (پیرا.): دارێکی کێوییە، لەکاتی هەنگوین کردنی هەنگاندا بەرێکی کەمێک سوور و درێژووکە دێنێ و ناخورێ.

**تیرهێش:** تیرێژ.

**تیری:** نانی تیری، نانێکە بە تیرۆکی پانکرابێتەوە.

**تیرێژ** (باد.): گەرماوی هەتاوێ، تیشکی هەتاوێ. (دزە.، ڕەو.، کۆ.) تیرێژوو.

**تیرێژوو:** (کۆ.، ڕەوا.، دزە.) تیرێژ، تیریژ، پارچەیێکی درێژووکەیە لەمەلاولای دەرپێ و کراس و کەوای دەدرێت، (باد.) تیرێژی، تیرۆژوو.

**تیرێژی** (باد.): تیرێژوو.

**تیریک** (دەر.): تاریک.

**تیریکایی** (دەر.): تاریکایی.

**تیز** (باک.): لووشکە، لەقە. قەشمەری، گەپ، مەزاق، تیتار، گەمە، گاڵتە، تیتاڵ.

**تیزانگ** (ئەردە.): میزەڵدان.

**تیزاو**: تێزاو.

**تیزەجاڕ**: ئەو کەسەیە گەمە و گاڵتەی پێدەکرێ. ئەو شوێنەیە گەمە و گاڵتەی لێدەکرێ.

**تیزەزارۆک**: گەپ، گاڵتە، گەمە، تیزەجاڕ.

**تیزپێکردن**: گاڵتە بەکەسێک کردن.

**تیزپێوەکردن**: تیزپێکردن.

**تیزوفیز** (خۆ.): دووچتە، کە دانرێن و بەرانبەری یەکتری نەبن.

**تیژ**: چتی بڕندە. شیخر (بۆ تیغ و دەرزی وئیتر). (باک.) خوڕ. کژ، زنج، زینی. ــ کردن: سوونەوە، بەهەسان و چتی تر، سووتن. توند، چوست، چالاک، گورج. ــ ی ئاوێ: خوورەک. سووڕ. کەسێکە لەسەر کردنی کارێک سووربێ. تونـد، تووژ، تیـژی بیبـار و ئیـتر. پەلـە، خێـرا. ــ ڕۆیشت: تیژڕۆ، تیژڕۆیی.

**تیژاڤ** (باک.): سێڵاو، لافاو، تیژاو. ئاوێکە تیژڕوات.

**تیژاو**: تێژاو، تێزاب. تیژاڤ، سێڵاو، لافاو. ئاو و خۆڵەمێش (مشکی) بەتێکەڵاوی ــ ی پێدەڵێن، کە ژنان لەگەڵ سابوونی کەل و پەلی چڵکنی پێدەشۆن. قەلیەیە، کە سابوونی پێدروستدەکرێ.

**تیژەچێژ**: هەست و چەشە تیژو ناسک.

**تیژەوکردن** (ئەردە.): هاندان، فیتدان.

**تیژباڵ**: باڵندەیێکە تیژبڕوات لەهەوادا.

**تیژبوون**: مەبەس لە سووربوونی یەکێکییە لەسەر کردنی کارێک. ــ ی چەقۆ و ئیتر.

**تیژبیر**: بیرتیژ. ــ ی: بیرتیژی.

**تیژپەڕ** (فە.): توندڕەو، تیژڕۆ. ــ ی: توندڕەوی، تیژڕۆیی.

**تیژڕەوت**: خۆشی ڕۆ. ــ ی: توندو خێرا ڕۆیشتن.

**تیژڕۆ**: توندڕۆ. ــ یی: توندڕۆیی.

**تیژک**: گچکە، چکۆڵە.

**تیژکەو**: کەوی گچکە.

**تیژکردن**: ــ ی چەقۆ و شیر و تیر بە هەسان، سوونەوە، بڕشت پەیداکردن بە تیغ. مەبەس لە هاندانی کەسێکییە لەسەر کردنی کارێکی. خۆشکردنی ئاوور.

**تیژهۆش**: زیرەک، هۆشیار.

**تیژی**: ــ تیغ: مەودا. ــ ی بیبار: تامی بیباری سوور و ئیتر. گورج، خێرا. بە ــ ڕۆیشتن: خێرا ڕۆیشتن. توندی.

**تیسەنینی** (دێرسم): تۆ چۆنی (بۆ نێرانە).

**تیسک**: لزگە موو یا لزگە خورییەکی درێژە. ــ ی لۆکە: پرتی. (جا.، هەورا.، ئەردە.) زەنگەتەی ترێ.

**تیسکاڵ**: تۆزقاڵ، تۆزێک.

**تیسکن**: ماڵاتێکە تووکەکەی پارچەپارچە و لزگەلزگە بەپێشوو درێژ ڕاوەستێ، کوڵکن، تیسکدار، تووکن.

**تیسماڵ**: تیشە. تیسماڵک. (کۆ.) تریسم، تیلسماک. (بابا.) تەلەزم. (باک.) پەلیس. پارچەیێکی گچکە و درێژ و باریکە لە دار، بەرد، ئاسن یان لە شووشە.

**تیسماڵک**: تیسماڵێکی گچکەیە.

**تیسووێ**: (خۆ.) تێسوو، دژری. گیایەکە بڵندە نێرتکەکەی پاک کرێ و بخوورێ بۆ زگ ئێشە زۆر باشە، سەری نێرتکەکەی جەوی دەردەکات لەگەڵ قەندی بەکوتراوی بە برینان وەرکرێ زۆر باشە و گۆشتەمزوونەی دێنێتەوە، بنەکەشی بەکوتراوی دەبێتە نەسپۆن.

**تیش**: (باک.) مێگەل، گەلە، کەرێک پەز. دڕاو، پارچە، ڕینەدۆڵ. (باک.) تاییژ. (ڕەوا.) تیشە، شاخ و بەردێکی تەنکە، کەژەکێو. (بل.) دەغڵێکی شینە، کە تازە سەری دەرهێنابێ و هێشتا لکی لێک نەبووبێتەوە.

**تیشە**: تیش، بەردێکە تەلاش لێک جووێ بێتەوە. تیسماڵک، شمشیرە. (هەورا.) تاش. پشتێندێکە لەو بەردە تەلاش تەلاشە بووبێتە کەمەرەی زەوی یا گرد و کێوان. (لو.، فە.) تەشووێ، بیوور.

**تیشەبەرد**: تیغە.

**تیشەمبی** (باد.): گاتوو، شاتوو.

**تیشەی جفت** (فە.): گاسن.

**تیشک**: پرشەنگ، پرشنگ، تریسک. تاو، هەتاو، (جا.) تیژک. (باک.) تریژ، تی، تیرەژ. (زەن.) لیسکی خۆر. ڕووناکی خۆر یا مانگ و ئیتر، کە لە دوورەوە لە شوێنێکی بدات. نێوی ئافرەتانە.

**تیشی** (دەر.): تەشووێ.

**تیغ**: (باک.) تیخ، ئاسنەلان، بۆچووم. ئاسنی تیژی بڕندە. ــ ی کۆن: گۆرت.

**تیغە**: دەپە، بەرچیت، ناوبڕە، ناڤبریک. (باک.) تیخە، چیت. دیوارێکی تەسکە لەنێوانی دوو دیواراندا. تەلاش، تەڕاش، دیواری تەسک و باریک. (هەورا.) تیشە بەرد، لای سەرەتیژەکانی سەرەوەی بەردەکانی سەر شاخییە.

**تیغەرە**: تیرەغە.

**تیغەشان**: زنجیرەی شاخان، تیغەی دیواری.

**تیغبەند**: تیخبەند، نشتوو و جادوویێکە گۆیا ئەوی پێی بێ نایبڕێ.

**تیغبەندی**: تیخبەندی.

**تیف تیفە**: ــ ی ڕیش و پیشی سەر، سیوسیوە، (باک.) شەهـ، قەیە. دووای تاشینی سەروریش جاری دووەمە، کەتیغی پێدا بخشێنێتەوە تا لووسبێ و شەوقاو تروسکداربێ.

**تیف تیفەدان**: دووای تاشینی ڕیش و سمێڵ بۆ جاری دووەم گوێزان یا ماکینەی ڕیش تاشینی پێدابخشێنرێتەوە.

**تیف تیفەدراو**: ڕیش و سەری تاشراوە، کە بۆ جاری دووەم تیغی پێدا خشێنرابێتەوە.

**تیف تیفەکردن**: تیف تیفەدان، تاس و لووسکردن، ئاڕایش دان.

**تیفل**: (باک.) کووز، قاش، قەتیک. ــ ەک شەبەش: قاشێک شووتی.

**تیفرک** (ئاک.): باڵندەییێکە بەقەد کۆتریکی دەبێ ڕەنگی بەرسینگی ئاسمانییە لەملاولای ملی سێ چوار خەتی زەرد و ڕەش و سپی پێوەیە، سەر پشتیشی نوختە نوختەی شین و زەردە. کلاوکوڕە.

**تیقل** (بار.): تێکوڵی ڕیواس و ئیتر.

**تیق** (کف.، ڕژ.): تاق، تاک، بەتەنێ. (باک.) قاقای پێکەنینێ.

**تیقمانەجووت** (ڕژ.): تاقمانەجووت.

**تیک** (شن.): درز و قەلەشتی دیوار و زەوییە. ــ بردن: درزبردن. (مرک.) ددانە مشکە. پشت ماسی، پشت ماسیلکە، مام شەبەقە. جۆرە دروومانێکە دوو پارچان پێکەوە دەدروون بەلان پێکەوە نانووسێنرێن بۆ جوانی دەسماڵ، هەندێکیش جمسەری هەردووکیان دادەگرنەوە. پارچە پەڕۆیەکە لەبەر تەسکی یا لەبەر ڕاستکردنەوە لە کراس و کەوا و ئیتر دەکرێتەوە. (باک.) ڕاوەستاو بەپێوە. توندوتۆڵ، گورج و گۆڵ.

**تیکار** (باک.): دیوار.

**تیکان** (هەورا.): چاڵووک.

**تیکە** (هەورا.): پاروو، کەرسەل. پارچە، کوت، لەت، قرتکە. (ئەردە.) برکە.

**تێکە**: پارچەیێک لە قاڵی. نوختە.

**تیکەپۆس**: پۆسپارە.

**تیکەتیکە**: پارچەپارچە.

**تیکەتیکەبوون**: پارچەپارچەبوون.

**تیکەتیکەکردن**: پارچەپارچەکردن.

**تیکەکریاگ**: پاروو لە گەروو گیراو.

**تیکە گۆشت**: پلە گۆشت.

**تیکەی زل**: نەواڵە، نوواڵە.

**تیکلە**: مەنجەڵۆکەی گچکەی مسینە. جەڕڕە. دیزەی گچکە.

**تیکڵە**: دیزەی ماست.

**تیکمە**: پڕ، تەژی، تژی، لێوڕێژ.

**تیکوڕک** (خۆ.): بەرقەوە تەماشاکردن. مۆربوونەوە.

**تیل**: (هەورا.، ڕژ.) خێل، چاوخوار، کەسێکە بە گۆشەی چاوی تەماشا بکات. خوار و خێچ. چووز. (باک.) لووس، کابا من تیلە، کابا من تووژە: تیژە. تیر، هاوێژتنی کەلا (مەرمەڕ بە قامک بۆ ئەوەی کەلایەکی تر بنگێوێ): ئازادــ ی ڕاستە (تیری ڕاستە). ــ کردن: تیر ئاوێژتن.

**تیلاک**: گۆشە. بەــ ی چاو تەماشای کرد: بە گۆشەی چاو تەماشای کرد. (گەرد.، دزە.) پێچ، پۆتراک، سەروپۆتراک. پێچی خوار، پۆتراکی خوار. سەرتاووسی، کەسێکە پێش سەری مووی پێوەنەبێ.

**تیلاوتیل**: خوار وخێچ، خوارەوار.

**تیلایی**: بە گۆشەی چاو ڕووانین.

**تیلە**: (فە.) تووڵەی دارەمێوی. (دەر.) کۆڵ، تێلەگە. ڕەشتاڵە، ئاژاڵ و وڵاخی ڕەشتاڵە. (باک.) ئازاد، ڕزگار، بەخشراو، پاکانەکراو. کەچ، خوار، سیلە. ــ ی چاو: سیلەی چاو.

**تیلەقەبیشتی** (گەر.): بڕبڕەی پشتی، کاریتەی پشتی.

**تیلەکۆ**: پارچە هەرێمەکە، لە کوردستانی ئێرانیدا و ناوی هۆزێکیشە، کە لەوێدا جێگیربووە.

**تێلەکێش** (هەو.): ئەو ژنەیە، کە سووالەی هەڵدەگرێتەوە و بە باقەباقە دایان دەنێ، لە گەرمێندا گۆیا تەنها کاری ژنانە.

**تیلک** (ڕەوا.، هەو.): قامک، تل. ــ یک لە ڕۆن یا لە دۆشاویدان بۆ چێژتنی. چووز. ــ پێوەکردن: چووز پێوەکردن.

**تیلکە**: تیکڵە، دیزەیێکە ماستی تێدا دەمەیێنرێ واتا شیری تێدا هەوێندەکرێ تا بیێتە ماست.

**تیلمسک**: پارچەی درێژ و باریکە، سا لە هەر چتێکی کرابێتەوە. تیسمال، تیلمە. (کۆ.، هەورا.) زەنگەتەترێ.

**تیلمە**: پارچە، کوت، لەت، تیلماسک.

**تیلی بەرانبەرێن**: تیر ئاوێژتنی دوو کەس بۆ کەلای یەکتری.

**تیلێن**: مەرمەڕێن، کەلایێن.

**تیم** (خۆ.): زاراوە.

**تیماج** (ئەردە.): تیمانج.

**تیمار** (هەو.، باک.): چارە، چارەسەر، دەرمانکردن. ــ کردن: دەرمان و چارەی نەخۆش و برینداران کردن. (باد.) ئالیکی شەرێییە، کە تەنها بەرەشەوولاخان بدرێ. (باک.، هەو.) ڕنەک. ــ کردن: ڕنەک کردن، شاڵ و قاشاو لێدان.

**تیمارخانە**: نەخۆشگە، خەستەخانە.

**تیمارستان**: نەخۆشگە، خەستەخانە.

**تیمارکەر**: چارەساز و دەرمانکەری برین و نەخۆشان. ڕنەک و قاشاوکردنی وولاخی بەرزە و ئیتر.

**تیمارکردن**: چارە و دەرمانکردنی بریندار و نەخۆشان. ڕنەک و قاشاوکردنی وولاخان و شاڵ لێدانی.

**تیمارگەر**: تیمارەوان، نەخۆشەوان.

**تیمانج**: چەرمی دەباغکراو، پێستی مەڕ و بزن و گوێرەکە و ئیتر، کە خۆش و ڕەنگ کرابێ بۆ پێلاو و فیشەکدان و چتی تر.

**تیمچە**: کاروانسەرا.

**تین**: تاو، تاب، تەووژم، تێن، پێز، گڤ، هەڤل، برە، نێرەوان، هێز، زەبر، ئەنیا، پرزە، زۆر. (شن.) شەنگ. (باد.) خور. گەرمایی، گەرمی ئاوور و هەتاو و ئیتر. بە ــ: هێزدار، تیندار، گەرم، وەتین. (باک.) شیرە و گەرم. بێ ــ: نەهووم، هەلی، تەشک، زراڤ، (باک.) چیقال، زراو. باریک، لاواز، بێ تووک، بێپێز، کەمتین. (باک.) تینوو.

**تینتینۆکە**: بیناقاقە، بنسەر، بنچەنەگە، بەربین، گەروو. ئێخە و بەرۆک.

**تیندار**: بەهێز، هێزدار، بەتین، پێزدار، بەپێز. (باک.) بگەودە، بۆک، بۆکە.

**تینشیر** (باد.) شیرەتێن.

**تینگ** (ئەردە.): تینوو. ئاڵوو.

**تینگاوتینگ**: ئاووس، تولپڕ. ــ هاتن: ئاووسبوون، تۆلپڕبوون.

**تینگ کەوتن**: ئاڵووکەوتن.

**تینگی:** تینوویّتی.

**تینوو:** توونی، (ڕەوا. هەو.) تیّنی، (شەبە. ڕۆژ.) تژنە، (هەورا.) تەژنە، (باک.) تهن، تیّهن. بۆزیندەوار و دار و شینایی و گژ و گیایەک بەکاردەبریّ، کە ئاتاجی بە ئاو و ئاوخواردنەوە بیّ، بەپیّچەوانەی (تیّراو)ییە. گەروو.

**تینوەتی گرتن** (هەو.): تینوەتی هیّنانەوە. کەسیّکە هەست بەبیّهیّزی و ناسازی بکات، کە بچیّتە لای لیّزانیّکی ئەویش لەدەرەوە قورقوراگەی دەگریّ، دەماریّکی لەبن قورگی دەکوشیّ تا بیّهۆش دەبیّ، کە وەهۆش هاتەوە بەتەواوی هەست بەلەش سووکی دەکات.

**تینوێتی:** توونیەتی، تهنی. ئارەزووی خواردنەوەی ئاو کردن.

**تینی** (باک.): شیرەوگەرمی. (لەک.) چالّی گەردن.

**تیو** (دهۆ.): خووار.

**تیوار:** تەنک، تەسک، تەنگ و تیوار.

**تیوانەوە** (دەر.): تووانەوە.

**تیواندنەوە** (دەر.): تواندنەوە.

**تیوەر:** (ڕەوا.) ڕاز. (هەورا.) تەمەلّ. بەرزی و بلّندی ئەو جیّگایانەیە، کە بە بەرقەدی شاخاندا دریّژەودریّژ دەرکەوتبیّ.

**تیوتی:** لار و لەوچ، خوارەوخووار، تەسکایی، تەسکی. ئاوەژووی بە پانەوە.

**تیوتیوە:** تیف تیفە.

**تیوتیوەدان:** تیف تیفەدان.

**تێوولّ** (فە.): نیّوچاوان.

**تیوول تەقێنە** (دەر.): قەپقەپۆک.

**تیوولّە** (ئەردە.): تەریلە.

**تیوێتی:** بڕوانە: تیوتی.

**تێوێلّ:** نیّوچاوان.

# ج

ج: تیپیّکی ئابیّی کوردییە.

**جا:** سا، دەسا، دەی، ئیدی، ئیتر، دووایە، جا، کەوایە، جاجاریّکیتر سستی نەکەی، جیّ، جیّگا، پلە، با، بلاّ، ووشەییّکە لە کاتی بیّ باکیّتیدا بەکاردەبریّ وەکوو: شیّرۆ دیّ بابیّ، نایە بانەیەت.

**جائاسمە** (هەورا.): بەجیّهیّشتن.

**جابڕ** (ڕۆژ.): ووتەی بیّ واتا، ووتەی بیّ سوود.

**جاپاندن** (باک.): جوولاّندن، جماندن، لەرزاندن.

**جاترە:** جەهتەر، (هەورا.) هەزبیّ، هەربیّلە، ئەزبیّ، هەزوە، (باد.) جەتر، گیایەکی مالّی وکیوییە بۆنی خۆشە لە ناو چیّشت و دانوولەی نۆکی دەکریّت، گیایە کە بەتەڕی یابە ووشکی ئاو یان ئارەقەکەی بدریّ بەوکەسەی، کە زۆری خوواردووە، خوواردنەکەی بلاّو دەکات و تەواو ئاسوودەدەبیّ. ژنیّکی بیّنوویّژنەبیّ و زگ وزای نەکات بەچای بیخوواتەوە چارەی تەواو دەکات، جاترە هەندیّک لەگەلّ ١٥ دەنک عەناب کەمیّک بکوّلّی و بکریّتە چا چاکترین چارەیە بۆ تەووژمی خووین.

**جاترە کێویلە:** گیایەکی بەهاری کیّوییە لە جاترە دەچیّ ئاو و ئارەقی وی بۆ ژانە زگ زۆر باشە.

**جاجر** (باک.): کوللیّرەیەکە لە هەنگووین و گوویّزی دروستدەکریّ.

**جاجرم** (باک.): جاجم.

**جاجک:** بنیشت، بنیّشت.

**جاجکە تالّە:** بنیشتەتالّ، بنیّشتی خاو.

**جاجم:** جاجرم.

**جاجیمان** (ڕۆژ.): ڕیسیّکی تایبەتیە بۆ جاجم ئامادەکرابیّ و کەبدریّ بە جۆلاّ تاجاجمی لیّ دروست بکات.

**جاچک** ( فە. ، دەر. ، لک.) : بنیشت، بنیّشت، بەنیشت.

**جاچکە:** بنیّشت، ویژەن، ژاژکە.

**جاچکە تالّە** (فە. ، دەر. ، لک.) : بنیّشتەتالّ، جاجکەتالّە. شیرەییّکە لەداری قەزوان دەگیریّت.

**جاچکە خۆشە:** بنیّشتی خۆشکراو و کولاّوە، بنیّشتی پوخت.

**جاچۆل** (هەورا.): جادوو، تەلەسم.

**جاچۆلگەر:** (هەورا.) جادووگەر. ـــ ی (هەورا.): جادووگەری.

**جاحیّل:** جحیّلّ، لاو، هەرزەکار. ـ ی: جحیّلّی، لاوی، هەرزەکاری.

**جاخ:** (ڕەوا.) جاغ، جۆرکی تووتنیّیە لەتوورەگەی گەورەتر و لە تەلیسیش گچکەترە، جارجارە لە مشەما دروستدەکریّ، (باک.) شیشەی کەبابییە، دیواریّکە لەدار دروستکرابیّ، (ئەردە. ، باک.) زیّد، نیشتمان، خاک، وولاّت.

**جاخچە:** کیسەی تووتنیّیەو لە جاخی چکۆلّەترە.

**جاخولکە:** جاخی گچکە.

**جادار:** جیّنشین، جیّدار. ـ ی: جیّنشینی، جیّداری.

**جادوو:** تەلەسم، باریەژن، جاچۆل، ئەفسوون، چازوو، یاتوو، تشتوو، زاریەست، دەمبەست، چاوبەست.

**جادووباز:** ئەفسوونگەر، جادووگەر. ـ ی: ئەفسوونبازی، جادووگەری.

**جادووبەن:** جادووبەند. ـ ی: جادووبەندی.

**جادووبەند:** تەلەسم کار، تەنەکەیە، کە لەزیّڕ یا لە زیّو نوشتووی چاوو و زاری لیّدەنووسریّ. ـ ی : تەلەسمکاری.

**جادووکار:** تەلەسمکار. ـ ی: تەلەسمکاری.

**جادووگەر:** جازووگەر، چاوبەست، جادوونووس، تەلەسم نووس، تەلەسم ساز، باریەژنگەر، ئەفسوونگەر، چاچۆلگەر، کوولّەنانی، جاچۆلباز، جادووباز. ـ ی: تەلەسم سازی، جازووگەری، جادووبازی، چاوبەستی، پیشەی جادووگەر.

**جادوونووس:** تەلەسم نووس. ـ ی: تەلەسم نووسی.

**جار:** چەل، چین، ڕا، گەڕ، گل، کەڕەت، هەل، حەل، دەم، تاو، دان، کەش، سەر، تائیستا تەنها جاریّکی کوردستانم دیتووە. ـ یّکی: چەلیّکی، چینیّکی، (باک.) گیایەکە، کسات، دەم، (باک.) مزر.

**جاڕ**: ووشـەیێکە، کەبکرێتـە پاشبەندی نـاوان دەیکاتـە نـاوی شـووێن: نێرگسەجاڕ: نێرگسستان، چلچرا. ناوی دەنگە، بـانگ، گـاز، بانگـەواز، هەڵاڵـە، هەراڵـە. ـــ ڕاهێشـتن: بـانگ ڕاهێشـتن. ـــ دان: بـانگکردن، گـازکردن، زەوییەکـە وولاّخ و ئاژاڵی بەئازادی تێـدا بلـەوەڕێ، ڕاسـایی، هامـاری، مـەیدان، زەوییێکـە لـە مێـژ بـێ نـەکێڵرابێ و گـژو گیـای زۆر لـێ سـەووز بوو بـێ، بـوور، بـەیار، پەنبە جـاڕ، (هـەورا. ، مـوک.) جێگـای پاشـەبەرەی بەرووبوومـە، زەوییەکـە بـەرووبوومی لـێ هـەڵگیرابێ و دروا بێتەوە، زەوی سەختی نەکێڵراو.

**جـاران**: چـەلان، لـەچاخانی پێشـوودا، ئەوسـا، بۆگەلـە: دووجـاران، سێجاران، لـەمەوسا.

**جارەجارە**: تاوتاوە، وارەوارە، بێن بێن.

**جارە**: ـــ (ئەردە.) تاوێر، سینەکەمان.

**جارەک**: یەکجار، چەلێکی.

**جارە ناجارێ**: جارجارە.

**جارەو جارێ**: جاریەجارێ، جارجارە.

**جارجار**: جارجارە.

**جارجاران**: بڕوانە: جاری جاران، جاران، لـەمەوبەر.

**جارجارە**: جارەجارە، نێونێوە، تاوتاوە، هاووڕهاووڕ، (باد.) بێن بێنە.

**جارجم** (باک.): جاجم.

**جارجیم** (باک.): جاجم.

**جـاڕچی**: (بـاک.): بانکـە، بانگکـار، بانکـەر، بـانگدەر، بانگـەوێژ، بانگەواز، کەرەلیاس، کەسێکە پیشەی تەنها جاڕ چیتی بـێ، هلالـەکەر.

**جاڕچێتی**: جاڕ ڕاهێشتن.

**جارچەنجارە**: هەلی چەندەم، نوبەییێکی تر.

**جاڕدان**: بانگەوازکردن، جاڕ ڕاهێشتن.

**جـاڕدۆ**: کـاردۆ، گـاردۆ نـاوێکی مێژوویی کوردانـە وەکـوو: گۆتـۆ، جۆتـۆ، کاردۆ، قاردۆ.

**جاڕڕاهێشتن**: جاڕدان، بانگەوازکردن.

**جـارس**: قـەڵس، هەراسـان، وەڕەز، بـێزار. ـــ بـوون: وەڕەزبـوون، هەراسـانبوون. ـــ کـردن: وەڕەزکردن، هەراسـانکردن. ـــ ی: وەڕەزی، هەراسانی.

**جارماز**: بەرماڵی نوێژێ، جانماز.

**جارنا** (باک.): جارێ، جارێکی، گاهێ.

**جارۆ** (باک.): ناوی مرۆڤانە.

**جاروو** (هەورا.): قسڵو زبڵ یا قسڵ و پەینی سووتاوە دەکرێتە قوڕ حـەوز و شووێنی تری وەکوو چیمەنتۆی پـێ سوواخ دەدرێ تا ئاو نـەدەلێنی. (فـە.) گسک، گزگ.

**جاروبار**: جارجارە.

**جاڕووبەند**: جێگایەکە بە جاڕوو سوواخدرابێ.

**جاروچەڵتووکی** (هەورا.): چەڵتووکجاڕ.

**جاڕووکار**: جاڕووبەند. ـــ ی: جاڕوبەندی.

**جارێ**: چەلـێ، ڕاوەسـتە، ووشـەییێکە بـە ڕووکـار نـاوە و وەکیـتر کـردارە: لـەوەلاّمی یەکێکیدا بڵێ دەنووم، دەڵێن ـــ مەنوو.

**جارێتر**: چەلی دیکە.

**جاری جاران**: ووشەییێکە چەند دەمێکی ڕابردوو نیشاندەدات.

**جارێک**: چەلێک، هەلێک، نۆرەییێک.

**جارێکان**: جارێک، جارێکی، جارێ.

**جارێکی**: هەلێکی، جارنا، گاهێ. ـــ تر: چەلێکی دی.

**جارێو** (هەورا.): جارێ، جارێکی، چەلێ، چەلێکی.

**جازۆ** (باک.): جازیا، لـەجادوو وەرگیراوە، ناڤێ ئافرەتانە.

**جازوە** (باک.): جادوو.

**جازێ** (باک.): ناوی ئافرەتانە.

**جاش**: (فە.) جاشک، کوڕی، (بـاک.) داش، دەهشـک، (هەورا.) جاشەهەر، کوڕین، (ئـەردە.) بەچکـەی کـەر، کـوڕگ، گیریـاگ، هـۆلی کـەران. کەسـێکە بـە پێـی دەستووری ئیسلام ژنێکـی سـێ بـە سـێ بـەرەڵا کـراوی بـۆ کاتژمێرێکی لـێ مارە دەکرێ دووایە بەرەڵای دەکاتەوە بۆ مێردی پێشـووی، کەسێکی بۆ دوژمنی نەتەوەی خۆی چەکی هەڵگری بە سینگی براو باب و مامی خۆیەوە بنێ.

جاش

**جاش ئێستر**: (تاو.) تولـەقاتر، داش.

**جاشەکەر**: بڕوانە: جاش.

**جاشەهەر** (هەورا.): جاشەکەر.

**جاشەهێستر**: جاشێکە، کە لـە دایک بوو تا چووار ساڵان چ نـێربی و چ مـێ بەڵان، کە گەیشتە ٥ساڵی دەبێتە ئێستر.

**جاشک**: لـە جاشی گچکـەترە، جاشکوڕی، داشـک، کـوڕی، جاشـەکەر، جاشولـە، جاشولکە.

**جاشکوڕی**: جاشک.

**جاشکۆڵە**: جاشکی زۆر گچکە.

**جاشماکەر**: جاشەمێیە، کە لـەسێ ساڵیدابێ.

**جاشماهەر** (هەورا.): جاشماکەر.

**جاش نێرەکەر**: جاشە نێرێکی سێ ساڵانەیە، (هەورا.) جاش نێرەهەر.

**جاشوولکە**: جاشی تازەبوو، جاشی گچکە.

**جاغ**: جـاخ، جۆرکـی تووتنێیـە لـەتوورەکـەی گـەورەترە و لـە تەلیسـیش گچکەترە.

**جاف**: گیایەکە. خێڵێکی گەورەیە لە لیوای کەرکوک و سلێمانی.

**جافەری**: (هەورا.) جەعفەری، تەرەییێکی ناسراوە.

**جاقی** (خۆ.): کەوی، ڕام، ڕاهاتوو. بێعار، لاسار، بێ گووێ.

**جاکاندن** (ڕۆژ.): جوون، جووینی بنێشت و چتی تر.

**جاکەش**: جاکێش، کوسکەش، سکەش، دەویت.

**جاکێش**: جاشکێش، جاشبەسەر کێشراو، کوسکەش، کوسکێش، (بـۆ جنێوە). ـــ ی: کوسکێشی.

**جاگە** (هەورا.): جێ، جێگا، جێگە.

**جاگر:** جێگر، جێگاگر. ــ ی: جێگری.

**جاڵە:** (هەورا.) تاوێر، هەتار، گاشە بەردێکە لە کێوانەوە خلۆر بکرێتەوە. ــ کردن: خلۆرکردنەوەی گاشەبەرد.

**جاڵەبەرد:** بەردی خلۆر بووەوە.

**جاڵەت:** دووخ.

**جالەق:** (رۆژ.) جێگالەق. ــ بوون: جێگالەقبوون.

**جاڵجاڵۆوکە:** (لو.) جۆلاّیی کەرە، (باک.) پیرعەڤۆک، تەڤن پیرک، بلۆ، (شەم.) پیرهەلالووک، (هەورا.) پەسپەسەکلێ، پەسپەسەکۆلێ، (رۆژ.) داپیرۆچک، داپیرۆکە، داپیرۆشکە، (هەورا.) مامالّە، مامالێ، (باک.) پند، پندەپیر، پیرک، پسپسەکەڵە، (ئەردە.) کاکڵە مووشان.

جاڵجاڵۆوکە

**جاڵجاڵۆوکەی زۆر گەورە:** چنگنە.

**جام:** (موک.، هەو.، رۆژ.، کە.، باک.): (رەوا.) بادی، (مەن.) بایە، یامە، قاب، ئامانی مس، بادیە، (باک.) ترار، ئاوخۆری، ئاوخۆرە، شووشە، (ئەردە.) وەنەدیگ، (جا.، هەورا.، ئەردە.) ئاوێنە.

**جامانە:** ئاغەبانوو، جوورێکیان پیاو لەسەری دەبەستی، جوورێکیشیان ژنان دەیکەنە کراس و دەسماڵ.

**جامانی:** (رۆژ.) ئاغەبانوو.

**جامەدانە:** ئاغەبانوو، جامانە. مندا لّدان، پرزانگ، پزو. زمانلووسی، کلکە لەقێکردن، سفتە، تەرزووانی.

**جامەدانی:** ئاغەبانوو، جامانە.

**جامەربە** (ماو.): ربە، کۆل.

جامەک

**جامەک** (هەمە.): ئاوێنە.

**جامەلووس:** زمانلووس، کلکە لەقێکار، سفتەکار، تەرزووان. ــ ی:

**جامباز:** وولاّخکڕو وولاّخفرۆش، دەلاّلی کڕین و فرۆشتنی وولاّخان و چێتر، زۆرزان، فێلّباز، (جانباز)، مەترەباز، ئەوکەسەیە لە سەر تەنافی هەلّدەپەرێ، تەنەباز.

**جامبازە:** جانباز، یاری کردنی ئەسپ و ووشترە و هەلّستانەوە سەرپاشوویان، جانبازە.

**جامبازخانە:** جانبازخانە، جێگایەکە تەنەبازی لێدەکرێ. دەلاّلخانەی کڕین و فرۆشتنی وولاّخان.

**جامبازی:** جانبازی، کڕین و فرۆشتنەوەی وولاّخ و کەل و پەل دەستبەدەست.

جامتا

**جامتا:** جانتا.

**جامتفرۆش:** (ئەردە.) ووردەفرۆش، ووردەوالّە فرۆش، خوردەچی، عەتار.

**جامجامک** (باک.): کەسێکە بەتەنێ گۆڤەندو دیلانێ وسەمایە دەکات وچەقەنەی لە دەستی خۆی خستووە چەقەچەقیان لێوەدێ.

**جامچی:** جام تێگر، شووشە فرۆش، ئاوێنە فرۆش، ئاوێنە ساز.

**جامچێتی:** جام تێگرتن، شووشە فرۆشتن.

**جامخانە:** شووشە خانە، ئاوێنەخانە، دیوی شووشەبەند.

**جامدانە:** جامەدانی.

**جامووڵە:** جامی گچکە، بادیەی گچکە.

**جامۆلکە:** جامی گچکە.

**جاموولکە:** جامی گچکە.

**جامی:** ناوی زانا و دانەرو هەستیار و وێژەوانێکی بەرزی کوردی کوردستانییە.

**جامێر** (هەکا.، باک.): جووامێر، ئازا، (باد.) جووان، دڵفراوان، بەخشندە، مەرد، دەستبلاّو. ــ ی: ئازایی، پیاوەتی، دڵفراوانی، مەردی.

**جامیلکە:** پارچەشووشەییێکی گچکە. قابێکی مسی گچکەیە، بادیلە.

**جان:** (باک.، بار.) جووان، لاو، جحێل، (فە.) گیان.

**جان ئافەرین:** گیان ئافەرین.

**جانکەندن:** گیان ئەستاندن.

**جانانە:** دۆست، یار، نازدار. بەستە و جوورە گۆرانییەکە. زۆرزان، عەیار، جادووباز، نفوورات، جامباز، جانباز، تێلّباز، زمانلووس.

**جانەر** (باک.): گیایەکی بۆنخۆشە گولێکی سپی بۆرەڵووکە دەگرێ.

**جانەگا** (باک.): جووانەگا.

**جانەوەر:** درندەو داعبایانی درو بەسام و زیاندەر، (زەن.) پرند، (جا.) پرندە، جەناوەر، جناوەر، داعبا.

**جانباز:** جامباز، فیلّەزان، پێشمەرگە، گیان لەسەربەری دەست، فیدایی.

**جانبازە:** جامبازە.

**جانبازخانە:** تەنەبازخانە، جێگایەکەلەسەر تەنافی سەمایەدەکەن، جێگای کڕین و فرۆشتنی وولاّخان.

**جانبازی:** جامبازی.

**جان بێزار:** ناوی جوورە تفەنگێکی بووە.

**جانتا:** باوولّی، چەلّتە، سندوقێکی چەرمینی دەسکدارە و کەل و پەلی تێدەنرێ و بە دەستیش هەلّدەگیرێ.

**جاندار** (باد.، هەکار.): گیاندار، گیانەوەر، پۆلیس، چەکدار، گیانباز، قوربانی، پێشمەرگە.

**جانداری:** (موک.): ژاندار، شاگردداروغە، تەنگە چەری.

**جانفاس:** (زا.) گونیەی تەنکی هەلّنەدووراو. چتمەکی ئاوریشمینی رووتە.

**جانکووش:** کەسێکە بەبانگکردن یابەتەقە کردن فەلان لەخەو هەستێنێ بۆ ئەوەی بچنە کلیسایە.

**جانگ:** (کۆ.) جاو، خام: ــ گازری.

**جانگی** (ئەردە.): لاجانگ، نێوانی چاوو گوێیانە.

**جانگیە** (جا.): لاجانگ.

**جانگیر:** جیهانگیر، ناوی مرۆیانە.

**جانگینە:** وەکوو جانگ.

**جانماز:** (هەورا.، جا.) بەرماڵ، دووگرد، دووگورد.

**جانۆ:** ناوی باوکی هەستیاری ناودار قەدری جانییە، خۆی ناوی عبدالقادر کوڕی جانۆیە بۆتە (قەدری جان) لەشاری (دێرکا) چیای مانری بەلاّن ئەمڕۆ لەشاری شامییە.

**جانووک** (باک.): جووانوو، جووانی، جەعنی.

**جانێ** (باک.): بەستەیەکی ناوداره لە گۆڤەند وشایی و زەماوەندان دەیلێن.

**جانێ**: گیانی، دۆسی، (هەر.، باک.، بار.) جووانوو، جووانی.

**جانی مەرگ** (باک.): جووره گوڵێکە.

**جاو**: (کۆ.) جانگ، (هەورا.) هەڵاوە، خام، چاپان، کاڵایەکە لە دەزووی لۆکە دروستدەکرێت.

**جاوان** (باک.): گاوان. ئێلێکی کوردەو زۆر ناوداره لە عێراقیدا سەربەخۆییێکی بەرزیان هەبووە (میر زیائەدین جاوانی) لەو خێڵەیە، ئیبن خەلە کانیش لە مێژووەکەی خۆیدا لەبەرگی ٢ و لە لاپەڕە ٨٠٦ لێی دواوە.

**جاوەجاو**: قسە جوونەوە، بەخاوی وبە پلتەپلت ئاخەفتن.

**جاوەڵووکە**: گیایەکی گەلاپانە بەزەویدا رادەکشێ گوڵی بلاوە وەکوو هی ڕێواسی وایە، هەرماڵاتێکی بیخوا ماستەکەی بۆ کزی لیدێ.

**جاوبڕ** (باک.): دووارد، مقەست.

جاوبڕ

**جاوپێچک**: نەوەرد.

**جاوراوە**: جووراوە.

**جاوکر**: ئەوەی جاو دەکرێ.

**جاووگ**: (ئەردە.) جاو.

**جاونانەوە**: ڕایەڵکردنی جاو، برێتییە لەکەسێک، کە زۆر هاتوو چۆ بکات.

**جاوید**: ئەمە، هەتاهەتایە، (ئاویّ.) یەڤە ئیتات.

**جاویدان**: هەتاهەتایە. ـــی: هەتاهەتایی.

**جاوی گازری**: جارێک بوو تا ماوەییێکی دەخرایە ناو شیاکەو چتیتر دووای شووشتنەوەی سپیتر دەبوو ودەکرا کراس و دەرپێ.

**جاوین** (ڕۆژ.): جوون، جووین، جوونی بنیشت وپاروو ئیتر.

**جاوینەوە**: جوونەوە.

**جاه**: جێگا، پایە، شان.

**جاهێڵ** (ڕۆژ.): جحێڵ، لاو، گەنج، جووان. ـــی (ڕۆژ.): جحێڵی، لاوی، جایەڵی، گەنجی.

**جایەڵ** (ڕۆژ.): جحێڵ، لاو، گەنج.

**جایی** (باڵە.): کابرا، هەرامە، هین، وانێک، فلانکەس، فلان.

**جایینگ**: لاجانگ.

**جە** (هەورا.): لە، ـــ ناکاو: لەناکاو، جەتو، لەتۆ.

**جەباخچۆر** (باک.): شارێکی کوردستانە لە بن دەستی ترکاندایە، زازان.

**جەباری**: خێڵێکی کوردە لە دەوروبەری کەرکووک دادەنیشن. جووره کەتیرەیەکە جیوەی تەپڵە گوێنییە.

**جەبە**: وولاخی یاخی، جەربەزە، بزۆز، دەربووێر ـــ ڕاو، (ڕۆژ.، کە.) بووڕین، بووردن، بەخشین، (کە.) نۆبەخش، شێخ ڕەزا دەڵێ: لەبەر عباکە (جەبە) م کردی ئەی فەقیری خووا.

**جەبەخانە**: چەکخانە، ئەنباری چەکانە.

**جەبەرە**: ساردی و سڕی، سەرما و سۆڵە.

**جەبەرە نووانەن**: خۆ لە ناو هەڵکێشانی چۆلەکەیە لە زستانیدا، کەنیشانەی سەرماو کرێوەو بارانەیە، یا پشیلەیەک لە تەنیشت ئاو دادەنیشێ نیشانەی داهاتنی سەرماو سۆڵەی زۆرە بەوانە دەڵێن: ـــ.

**جەبرا** (باک.): چەپە، چۆپە، کەسێکە هەمیشە بەدەستی چەپە کاربکات.

**جەپخانە** (باک.): جەبەخانە.

**جەت**: شەوەرە، گیایەکە.

**جەتر** (باد.): جاترە.

**جەترەقە**: (هەورا.) جەدرەقە، جووره نانێکە لە بابەت پانی و ئەستوورییەوە لە نێوانی نانی و کولێرەدایە.

**جەجاڵ** (کە.): ججاڵ، (دجال).

**جەحەندەم**: جەهەننەم، دۆژە.

**جەحری** (باک.): ژەهر.

**جەحشک**: جاشک.

**جەحفەری**: (ڕەوا.) بیژەڕوو، (بار.) ڕیشاڵۆ، (بار.، ڕەوا.) ڕیشاڵۆک.

**جەحێڵ**: جحێڵ، لاو، گەنج. ـــی: جحێڵی، لاوی، گەنجی.

**جەخ** (باک.): خۆشڕابووێر، تێروپڕو جەختی، دەست درێژ.

**جەخار** (ڕۆژ.): کێرد، چەقۆ، سیکارد، قیمەکێش. جخار، سووێ، داخ، پەڕۆش، خەفەت.

جەخار

**جەخەری** (باک.): جووره پۆڵایەکە، کە شیری لێ دروستدەکرێ.

**جەخت**: (ڕۆژ.) باڵشت، بنج بەستکردن، کەسداندن، هەوڵ و تێکۆشانی بێپسانەوە بۆ کاروبارێکی. چاک، باش، پیرۆز، دووجاران بەبێ ووچان پشمین. کەسێک جارێکی بپشمێ دەڵێن سەبری هێنا بەڵان، کە دووجاران بپشمێ دەڵێن چاکی هێنا، پەلە، تاڵووکە، بە ـــ: بەپەلە، بەتاڵووکە.

**جەختهێنان**: دووجاران پشمین بە شووێنی یەکتریدا لە کاتی ئاخۆتن یا بڕیار و ڕاڕەوێکیدا، کە بەفەرو پیرۆزی دەزانن.

**جەختی**: چالاکی و چابوکی. بە ـــ ڕۆیشت: واتە بە چالاکی ڕۆیشت.

**جەخز**: جێخێر، دێخ، گێڕ، گیر، چزخ، دیخێکی بەگەوەو خڕە، (شار.) جەخیز، چووز.

**جەخزجەخزانێ**: گەمەیەکی کوڕانە.

**جەخزێن**: جەغزێن.

**جەخسی** (باد.): وەستای تفەنگ و دەمانچان، چەکساز، تفەنگ و دەمانچە ساز.

**جەخیز** (باک.): جەخز.

**جەخواسی**: گیایی.

**جەدەو** (باد.): جدەو، برین یا دەردێکە دەکەوێتە پشتی ئەسپ و ئێسترو کەران و زۆر دەخایێنی و زوو چانابێتەوە بەهۆی بار کردن و یا زین و کورتانەوە.

**جەدەوی**: جدەوی.

**جەدرەقە**: جەترەقە.

**جەڕ:** جەڕە. جوورە بزمارێکی پێچدارە بەبادانی توند دەبێ و دەکرێتەوە، پێچ.

جەڕ

**جەڕبوون:** (باک.) ڕزگاربوونی گیانداری ئاووس مەبەس لەزانێتی، جەڕاندنی گیانداری ئاووسە بەزگەکەیەوە لەکاتی زایینیدا.

**جەڕان:** گیر خواردنی چتێکییە لەناو چتێکیتردا بەڕەنگێکی وا، کە زۆر گران بێتە دەرەوە، فیسارەژن بەمنداڵەوە جەڕاوە، فیسارە کەس بە میزەوە جەڕاوە.

**جەڕاندن:** بەستران، بەستن و شەتەکدانی چتێک، سفتکردن.

**جەڕانن:** جەڕاندن.

**جەڕاوە:** بەسراوە.

**جەڕڕە:** تونگەی گەورە و زار تەنگە لە گڵی دروستەکرێ بۆ ئاوێ، (باک.) جەڕ، جەرک، جەبان، جێر.

**جەڕڕەبادان:** بەستن و شەتەکدانی چتێک زۆر بە توندی.

**جەڕڕەتاو:** چڵکاو.

**جەڕبادەر:** ئاسنێکی لووت پانی کلکدارە جەڕی پێ بادەدرێ.

**جەڕبەزە:** ئازا، تونددوتۆڵ، بزۆز. بێشەرم، شازدەهەناسە، پێکراو، هەمەڕەنگە، کەرکاش، بزێو، بزۆز، (هەورا.) جەڵبەزە.

**جەڕبەزەیی:** ئازایی، بزۆزی، بزێوی، چەتوونی، بێشەرمی، پێکراوی.

**جەرت و پەرت** (باک.): جرت و پرت، زۆر بڵێیی، چەنەلێدان.

**جەرجەر** (باد.): جەنجەڕ، گرگرە، کرکرە، دۆڵابی ئاوێ.

**جەڕجەڕە:** جەنجەڕی بیران.

**جەرجەرڤان:** جەنجەڕەوان، کەسێکە جەنجەڕی بگێڕێ.

**جەرجوور** (باک.): زیخ، وورده بەرد، خیز. قابوغی فیشەکانە.

**جەرجهە** (باک.): لێزان، مەحلان، کارزان، ووریا، هونەرمەند، زیرەک.

**جەرخەتوو** (باد.): ئاوگردان.

**جەرخەتوون** (باد.): ئاوگردان.

**جەرد** (باک.): بەند، بەستن. جەردە. (زا.) مشک.

**جەڕدار** (فە.): سەرڕەق، کەللە ڕەق، مانگرتوو، لاسار.

**جەردام** (ڕۆژ.): گۆلاوی بارانەو ئیتر.

**جەڕدان:** بادان و پێچدان بە توندی و سفتکردن.

**جەردە:** (فە.) تەیرە، کەلەش، نژدە، جەرد، جەردەڤان، تەریە، تەریدە، گۆران، ڕێگر، تەتەر، ترک، چەتە، (باک.) ئەبابۆز، جەردەڤان، بەیەکێک یا چەند کەسێک دەڵێن، کە ڕێگا بەکاروان و هاتوو چۆکاران بگرێ و بە زۆر ڕووتیان کات.

**جەردەڤان** (باک.): جەردە، دز.

**جەردەیی:** (باک.) ئەبابۆزی، تەتەری، ڕێگری، جەردەڤانی، ڕێ بە خەڵکگرتن و بەزۆر رووتکردنەوەی.

**جەرسی** (باک.): بێ ئابڕوو، ئابڕووبراو.

**جەرقین** (باک.): قرەقرکردن، تەقەتەقکردن.

**جەڕک** (باک.): جەڕڕە، گۆزەی زارتەنگ.

**جەرکەهلین** (باک.): جاڤزێلک، ناوێزە، ناشنا، پەپرس.

**جەرگ:** (بال.) جەگەر، مێلاک، جگەر، (هەورا.) بەهەر، (باک.) پشارەش، پێلاڕەش، دەبێ بەندیوارێکی گرنگیان پێکەوە هەبێ بۆیە ئێمە دەڵێین جەرگ و دڵ. پارچە گۆشتی سووری ناسکە لە خوار سیپەلاکەوە بە قوڕقوڕاگەی گیاندارەوە نووساوە، بە ـــ : ئازا، خوێنگەرم، بێ ـــ : ترسەنۆک. ددان بە ـــ ی خۆداگرتن: ئارامی گرتن، هێدی و هێمن بوون، ڕۆڵە، منداڵ.

**جەرگاووس:** دەهری، تووڕە، تەنگە تاو، وەڕەز. ـــ ی: دەهرێتی، تووڕەیی، دەردێکە جەرگی مرۆی ئاووس دەکات بە هۆی نۆ بەتێی کۆن و کەوتوویی وسەرما و گەلێ هۆی تر، ئاوی گەلابی، کە لە ئاویدا خووسابێ بۆ ئازاری جیگەرو سیی و لێدانی دڵ و دەردی سینگ و سل زۆر باشە، گولی پنگیش بە ئاوەوە بکوڵێ بۆ جەرگی ئاوس، کە لەسەرماوەبێ باشە.

**جەرگ ئێشە:** ژانی جەرگ.

**جەرگە:** چەق، نێوەڕاست، جەنگە، جەڵە. (باک.) جڤینۆک، جڤات، بایزلەنێو ـــ ی شەڕەکەدابوو.

**جەرگەبەز** (باک.، شکا.): ڕەشبەڵەک. (باک.، شکا.) پارچە جەرگێکە لە نێو چەوریدا سوور بکرێتەوە یا بە بەزەوە ببرژێنرێ.

**جەرگەتاو:** (؟)

**جەرگبڕ:** جگەربڕ، جەرگمژ، خوێنمژ. دەنگوباسی ـــ : واتا دەنگوباسی جەرگبڕ و ناخۆش.

**جەرگبڕان:** زگسووتان، ڕۆڵەمران، دڵسووتان، زۆرلێکران.

**جەرگبڕاو:** زگسووتاو، دڵسووتاو، جەورو بێدادی لەتەکدا کراو.

**جەرگبڕین:** کوژتن.

**جەرگدار:** ئازا، بەجەرگ. ـــ ی: ئازایی.

**جەرگسووتان:** جەرگ هەڵقرچان، مندا ڵمردن، جگەرسووتان، (ڕۆژ.) پەلاس.

**جەرگسووتاندن:** منداڵ کوشتن.

**جەرگسووتاو:** زگسووتاو، منداڵ لێمردن و جگەرسووتاو. زۆر و بێدادی لەگەڵکراو.

**جەرگسۆز:** جگەرسۆز، دڵسۆز. ـــ ی: دڵسۆزی.

**جەرگقایم:** ئازا، دلێر، بەجەرگ. ـــ ی: ئازایی، دلێری، بەجەرگی.

**جەرگماسی:** جەرگ ئاووسان.

**جەرگ و ناو:** جەرگ و هەناو.

**جەرگ و هەناو:** دلجگەر، (ڕەوا.) جەرگ و ناو، جیگەروسی، شووش و پەهەر، جەرگ و سیپەلاک.

**جەرگوهناڤ** (باد.): جەرگ و ناو، جەرگەدل.

**جەرگ هەڵقرچان:** جەرگسووتان، زگسووتان، جەرگبڕان. ـــ دن: زگسووتاندن.

**جەرگهەڵقرچاو:** زگسووتاو، جەرگبڕاو. ـــ ی: زگسووتاوی.

**جەرمە:** زۆردە، مێوەی نیوە ووشک.

**جەڕنا فرنا:** جەڕناوفرنا، گیان لەبەری پڕوپووچ.

**جەڕنە** (ڕۆژ.): مەڕی شاخدار.

**جەڕومەنگەنە:** مەنگەنە، دوو تەختەی ئەستووری درێژە لەھەر دووک سەرەکانیدا جەڕی پێوەیە پەرتووکی تێدەخرێ و بۆرغیەکانی توند دەکرێ تەختەکان دەنیشنە سەر یەکتری و پەرتووکەکە دەق دەگرێ لەم سەردەمەدا هی باش لە ئاسن دروستدەکرێ بەئارەوی پێی دەڵێن (مکبس).

**جەڕی** (فە.): ڕقەبەری، جەنەگرتن، سەر سەختی.

**جەڕیە:** دوو تەختەیە وەکوو جەڕو مەنگەنە، زیندروو یا چەرمدروو چەرمی پێدەگرێ لە کاتی دروونیدا.

**جەریفک** (باد.): گسک.

**جەڕین:** جەڕان.

**جەزایەچی:** کێشکچی.

**جەزبەلۆک** (باک.): گیایەکە.

**جەزخ:** جزخ، جەزغ، شەفت، شەفتی.

**جەزرەبە:** ئازار، ڕەنج، مەینەت.

**جەزرە بەپێگەیاندن:** ئازاردان.

**جەزرەبەدان:** ئازاردان.

**جەزرەبەگەیاندن:** ئازار پێگەیاندن.

**جەزرەوە** (ئەردە.): جەزرەبە، دەردەسەری، چەرمەسەری.

**جەزوو** (باک.): خوری مەڕان.

**جەزیرە:** گراوە.

**جەژن:** ڕۆژی شادی و خۆشی و ئاهەنگ، جەژنی سەری ساڵێ، جەژنی گوڵان، جەژنی نەورۆزێ، جەژنی ڕۆژووان، جەژنی قوربانێ، جەژنی ڕزگاری کوردستان، جەژنی ئازادی کوردستان، جێژن.

**جەژنانە:** دراوێکە جەژنان بەمنداڵ و هەژاران دەدرێ.

**جەژنە پیرۆزە:** جێژنە پیرۆزە، جەژنەپیرۆزی لەیەکتری کردن.

**جەژنە پیرۆزی:** جەژنە پیرۆزی لەیەکتری کردن.

**جەژنەچەقالە:** جەژنێکە جوولەکان چەقالەو تۆکوولەکەی سوویری تێدا دەخۆن.

**جەژنە فەتیرە:** جێژنێکە جوولەکان نانی فەتیری تێدادەکەن.

**جەژنی ئازادی:** جەژنەی سەربەخۆیی.

**جەژنی ڕۆژووان:** جێژنێکە بەبۆنەی ڕزگاری لەتەنگ و چەڵەمەی مانگی ڕۆژووان ڕێکخراوە.

**جەژنی سەری ساڵ:** جێژنێکە بەبۆنەی سەری ساڵێوە. دەکرێ وەکوو: جەژنی سەری ساڵی فەلان، جەژنی گوڵانی خۆمان.

**جەژنی قوربان:** جێژنەی قوربانێ.

**جەژنی نەورۆزێ:** جەژنی ڕۆژی نوێ. کورد ــ بە جێژنێکی نەتەوەیی دادەنێت، کە هێمای سەرکەوتن و سەربەخۆیی دەبەخشێت. لەپێش زایینداسۆمەری و دراتر گەلانی ئێرانی زمان ۲۱ی مارتیان بە جێژن داناوە و ئاهەنگی تایبەتیان بۆ گێڕاوە.

**جەسە** (ئەردە.): جەستە، لەش، تەن.

**جەسپەر:** (کە.، ڕۆژ.، شار.): سنوور، تخووب، (بۆزەوی و زار). (کە.، ڕۆژ.، شار.) جەمسەر بۆنێوانی دووبەردو دوو پارچە کاڵاو قاقەز و ئیتر. ــ ی(کە.، ڕۆژ.، شار.): مەیانەیی، سنووری، تخووبی، جەمسەری.

**جەستە** (هەورا.): لەش، تەن، بەدەن، دەستە، کەس بە ــ ی مـن نەبێ: کەس بەدەستەی من نەبێ. حەمەدئاغای دەربەند فەقەرە دەڵێ:

هێندە خاک و سەنگ و جەستەم بارەن
نەجاگەی جوواب نەڕای گوفتارەن

**جەعەتنی:** جەعێتنی، جعێتنی، جوورێکە لە ڕەگەزی چارەوێ.

**جەعبە:** سندووقی گچکە، فیشەک گیر.

**جەعبەر:** کەلەھەکە لە جزیرێ و لە قەراغی چۆمی فوراتێ گۆڕی سلێمان شای باوکی عوسمانیانی تێدایە.

**جەغز:** جەخز، خێخێز، جووز، گەوە، دێغێکەخڕ کێشرابی.

**جەغزێن:** جوورە گەمەیەکی منداڵانەیە.

**جەفا** (موک.، هەورا.): ئازار، ڕەنج.

**جەفەر** (پژ.): چارە، ڕوخسار، ڕوو.

**جەفەنگ:** فشە، گاڵتە، بەزم، درکە، گووشە، ڕیک، هێما.

**جەفت** (باک.): قەپووچکە ڕەقەکانی بەڕوویە، کڵاوی بەڕوو، جەوت. بە بیروڕای هەندێکیان یەکێکە لەبەرەکانی دارە مازووە جەوتە بەڵام لووس و پاکە وەکوو جەوت کنجر کنجرنییە.

**جەفتاو:** ئاوی جەوتین، کەلەناو کوندەدایە.

**جەفتین:** کوندە و مەشکەی خۆشکراو.

**جەفل:** ترس.

**جەفلاندن** (باک.): ترساندن.

**جەفلین** (باک.): ترسان، ماندووبوون، خاوبوونەوە.

**جەقات:** کۆبوونەوە، ئەنجوومەن.

**جەقجەق** (باک.): ناوی چۆمێکییە لە سەرەوەی ناوی ڕەش لە ژوور شاری نسیبینێ دەردەکەوێ بە نێو شاری نسیبین و قامیشلوویدا تێدە پەڕێ لە شاری (حسکە)دا تێکەڵ بە چۆمی خاپووردەبێ.

**جەقین** (باک.): زناو، قووڕەتێنە.

**جەکۆ** (هەورا.): لەکووێ.

**جەگەر** (باک.): جەرگ، جیگەر، کەزەب. جارجارە بە واتای دڵ دێ.

**جەگەرخوون:** یا جیگەر خوێن ناوی هەستیارێکی کوردی بەرزی کوردستانی باکوورە ئێستا ئەگەر مابێ لە شامێ دادەنیشێ و زۆر دۆستی منە. واتای جیگەر خوێن بە بیروڕای وی ئاوایە: (لێرەدا مەبەس لە جیگەر دڵە) نەک جەرگە: دڵبەخوێن، دڵبریندار، لە دیوانی من ژمارەی (۱) تەماشاکەن و لە دیوانی سەیدایی خانی ئەو ناوەم وەرگرتووە: مەمی جیگەر خوون واتە دڵبریندارو دڵپڕلە خووین.

**جەگەرمز:** ناوی سەردارێکی دەرەبەگی مووسڵ بووە زۆر خوێنخۆر و تالانگرو مێرکوژبووە، گەلێکیشی لە کوردان کوژتوە. گۆیا هەرچەندە جەگەر جەرگە بەلان لەم جوورە شوێنانەدا مەبەس لە دڵە.

**جەگەن:** گیایەکە بڵند هەڵدەچێ، کەتەنها حەسیرو کورتانی لێدروست دەکرێ، زەل، لەبان.

**جەلاد** (ع.): جەلاو، نەسەقچی.

**جەلاقی** (باک.): دۆشاوی کولاو، دۆشاوێکە بە کوڵاوی پەیت و توند بوو بێتەوە.

**جەلال** (باک.): ڕەوان، (جاری). ــ بوون: ڕەوان بوون. ــ کرن: ڕەوانکردن. (باد.) نەواڵێکی قووڵی پڕگیایە، کە ئاویشی دەبندابێ.

**جەلالی:** خێڵێکی کوردە زۆر گەورەیە کەوتووتە نێوانی سنووری دەستکردی ئێران و تورک و لە هەردووک لایاندان خێڵێکی زۆر دلێر و نەبەز و ئازان.

**جگ:** (قلْپ) مەندومی. لاقووڵەکەی: جک، دزەیی (قۆیزان) ی پێدەڵێن لاقۆقزەکەی: بک، دزەیی (پشتان) ی پێدەڵێن. لالووسەکەی: شەک، دزەیی (میر) ی پێدەڵێن. لایەکەی تر: تەوق، دزەیی (کەر) ی پێدەڵێن.

**جەلاندن** (باک.): ئاوەگڵکردن، چتی گلاو حەوت جاران بە ئاوو قوڕە سووری شووشتن.

**جەلاو** (فە.): جەڵەبی، ئاژاڵفرۆش.

**جەلاوی** (باک.): جلە.

**جەلە:** پیشۆک، پیفۆک، کیفۆک و بنکە قومامێکە، کەمندالآن وەکوو فیشەکدان دەیهۆننەوە و لە ملیانی دەکەن و بە کولآویش دەخورێ و خۆشە. (ڕۆژ.) ئاڵقەیەکە وەکوو تایەی ئۆتۆمۆبیل لە قایش و پەڕۆو پاتاڵ دروستدەکرێ لە ملی ئێستر یا گا جووت و ئیتری دەکەن تا هێزو نەهێمی نیڵەکە ئازاری سەرملیان نەدات. نیر مرازێکە لە کەرەستەی جووتی دەخرێتە سەر ملی دوو ئێستر یا دوو گاجووتانەوە. ڕەقەی زۆر گەورەیە لە ناو ئاوێ دەژی، (بیت.، پژ.) سووێروو.

**جەڵە:** سەمەندۆک، سنک، چەند وولآخێک ناوناوە لە گوریسێکی درێژ دەخەن، کە ئاژۆتران بەرێز بە دووای یەکتریدا دەڕۆن. ــ کردن: سەمەندۆک کردن. (ڕۆژ.) چاولەدوو، ئازوەری، قاڕنان (حریص)، کەسێکیشەلە کارێکی بەربەست بکرێ ئەویش سەرەڕای ئەوەش لەو کاریدا وە پێشتر بکەوێ.

**جەڵەب** (ئەردە.): جەڵەو، بەدکار، خراو، گوریز، (باک.) زرنگی، شێوە، لێهاتوویی. نەژاد. مێگەلە، ئاژاڵ و وولآخێکە بۆ فرۆشتنەوەی کرابێ. کوو. چەشن، بابەت.

**جەڵەبچی:** کەسێکە جەڵەبی بکڕێ و بفرۆشێتەوە، واتە کەسێکە ئاژاڵ و وولآخ و ڕەشە وولآخان بۆ فرۆشتنەوە بکڕێ.

**جەڵەبچێتی:** کڕین و فرۆشتنەوەی ئاژاڵ و وولآخ.

**جەڵەبدار:** بازرگانی مەڕو بزن و ڕەشەوولآخ و وولآخان. ــ ی: بازرگانێتی ئاژالآن و وولآخان.

**جەڵەبی:** چەڵەبی، کەسێکە ئاژاڵ و وولآخ و ڕەشە وولآخان بکڕێ بۆ فرۆشتنەوە، چتێکە هەڕەمەبێ و تایبەتی نەبێ.

**جەڵەکردن:** چەند وولآخێک ناوەناوە لە گوریسێکی درێژخستن.

**جەڵەو** (باک.): شیپەلەغاو، جڵەو، هەوسار، هەڤسا. دەستەجڵەو، جەڵەب، مێگەلە ئاژاڵ و ئێسترە بۆ فرۆشتن بیکڕن.

**جەلەولا:** شارێکی کوردی ناوداره لە ژووری خانەقینێیە لەشکری عومەری لەگەڵ خەڵکی ئەم شارە شەڕی کرد.

**جەڵەوی:** چەڵەبی.

**جەلب** (باک.): قوڕو چڵپاو.

**جەلبەزە:** جەربەزە.

**جەڵد:** ئازا، خێرا، توندو تۆڵ.

**جەڵغ:** (باک.) قەڵەشت، درز.

**جەڵغە:** دووداره، کە سەریان وەکوو قەڵەمی دادرابن وکرابن بەیەک، کاری ناتەواو و نا پوختە.

**جەڵغەمە:** جەلغە.

**جەلک** (باک.): ناسک. ــ کرن: ناسککردن. ــ ێ دەست: مست، لووێچ.

**جەلیاندن** (باک.): دەرهێنان، دەرکردن.

**جەم** (باک.): کن، نک، لا، با، بال، ڕەخ، لجەم: لەکن. (موک.، هەورا.) ژەم، نۆبە، جار، کەڕەت، هەل، حەل، مرۆ لە شەو و ڕۆژێکیدا سێ ــ نانی دەخووات واتە سێجاران. (باک.) پاشکۆ، خورج، خورجێن، (ئەردە.) گرد، گلیر، کوو، جەڵە، گەڵ، گردواری، یەکەونیان. (خۆ.، بلێ.) چاک و قورس بۆ قاب و ئامانی مسین، ڕەختە.

**جەما** (هەورا.): جەمام، لەگە، لەجێ، جەما بوونی جومگە یا گەی قامکان و شووێنی تر: لەجێچوون، لەگەچوون. ناوی جێژنێکی برا کوردەکانی یەزیدییە.

**جەمالا** (باک.): ناوی تیرەییێکی کوردە لە خێڵی کیکا.

**جەمام** (جا.): کەسێکە کەم گەڕابێ وزوو ماندوو بێ، (زرا.) قۆراخ، (موک.) ئەستووربوونی جومگە یا ئێشانێکە لە ئەندامدا بەهۆی ماندووبوونەوە، سڕبوون، سست، (هەو.) جەمان. ــ بوون: ئەستوور بوونی جومگە و ئێشانی ئەندام یا دەمار وەرگەڕان بە هۆی کاروبار و ماندووبوونەوە. ــ کردن: ئەستوورکردنی جومگە.

**جەمامی:** دەماروەرگەڕان، ئەستوور بوونی جوومگەو ئازاریەتی بە هۆی ماندووبوونیەوە.

**جەمان** (هەو.): جەمام.

**جەماوەر:** دەستەمرۆڤێکە، کە لە شووێنێکی کۆ بووبنەوە.

**جەماوەری:** شتی سەر بە جەماوەر.

**جەمەدانی:** ئاغەبانوو، جامەدانی.

**جەمەکە** (باک.): کرێ، مووچە، مز.

**جەمەوبوون:** کۆبوونەوە.

**جەمباز** (باک.): لۆتی، زەلزەلە، تەنافباز، جەنباز، ئەوکەسەیە، کە لە سەر تەنافی سەمایە دەکات.

**جەمبازی:** تەنافبازی، جەنبازی.

**جەمبەلی** (باک.): تووتنی توند. جەنبەلی ناوی میرێکی هەکارییە بەسەرهاتی وی و بنەفشی نارین لە کوردستانێدا ناوداره بە بلووێر و گۆرانی دەیلێن.

**جەمبەلەیی** (باد.): تووتنی توند.

**جەمجتین** (زا.) شڵەقانی چتی شل.

**جەمجقاندن** (باک.): بەقامکان هە لپشاوتن و هەویرکردن، تێکەلآوکردن، جوولاندن، بزواندن، شڵە قاندنی چتی شل.

**جەمجقین** (باک.): بەقامکان هە لپشێوران، تێکەڵبوون، جوولآن، بزووتن.

**جەمرێوە** (هەورا.): ماوەیەکە.

**جەمسەر:** چەسپەر، سەری دوو چتانە، کە بگەنەوە بە یەکتری، بەسەری دوو یا چەند پارچان دەڵێن، کە جووت پێکەوە بنووسێنرێن و بگەنەوە یەکتری.

**جەمک** (باد.): دووانە. ژەمک.

**جەمکردن:** کۆکردنەوە، گردەوکردن، حەڵەکردن.

**جەمۆ:** ناوی بەستەیەکی کرمانجییە.

**جەمهور:** بە پێی بیرو ڕاو لێکدانەوەی جیگەرخوین لەبەرگی یەکی فەرهەنگەکەی لە لاپەڕە (٣١٠) دا نووسیوییە: (جەمهور) لە دوو ناوان پێک هاتووە جەم مەبەس لە کۆڕو جڤاتە، (هور) یش بەواتا گچکە و وورد، وادیارە لە چاخی ساسانییەکاندا دوو کۆمەڵگە (جڤات) هەبوون: جڤاتی سەرا و جڤاتی هوور، کەسرا، کەیسەرا مەزن و سەرۆکی جڤاتی سەرایە بوو، کە بە ئارەوی (عظیم العظماء) ە. و(بزور جەمهور): مەزنی جڤاتی هوور (گچکەکان) بووە، جڤاتی سەرایە(مجلس الشیوخ، مجلس الاعیان)، جڤاتی هوور (المجلس النیابي) بووە لە پاشان کەوتووتە ناو زمانی ئارەوییەوە بۆتە جەمهووریە، بەڕاستی، مامۆستا جیگەر باشی بۆ چووە و ڕاستە هەزاران ئافەرین. *(گیوی موکریان)*.

**جەمیداندن** (زا.): ساردکردنەوە.

**جەمیدین:** ساردبوونەوە.

**جەمین:** (باک.): بزووتن، لەرزین.

**جەنانێر** (باک.): هەڵوچەرەشکە، کارچڤ، کارچک، هەڵوژەرەشکە.

**جەناوەر** (باک.): جانەوەر.

**جەنە:** ڕق، مان، هۆک، گڕوو، منداڵەکە ــ ی گرتووە: گڕووی گرتووە. ــ گرتن: غەزرین، مانگرتنی ئەسپ ومایین وئێستروکەر.

**جەنەب** (ئەردە.): ڕوواڵەت، شێوە ،شکل.

**جەنەکە** (هەر.): پارچە.

**جەنەگر:** ئەوەی جەنە دەگرێ، ڕق دەگرێ.

**جەنەگرتن:** گڕووگرتن، مانگرتن.

**جەنتک** (زا.): جەواڵی گچکە.

**جەنجاڵ:** قەرەباڵغ، سەرقاڵی، دەست نەپەرژان، کۆبوونەوەی مەردوم لەشووێنێکیدا بە زۆری و نارێکی، چیوکوت.

**جەنجەڕ:** مۆشەنە. ــ ی دار: (باک.) کام. دارێکی ئەستووری خڕە چەند دەمەتەورێکی تێدا داکوتراوە و خەرمانی پێ دەکوترێ لەکاتی گێرەدا. چەرخی ئاوپێ هەڵێنجان لەچالاوان. ئاسنی ئەمسەرەوسەری باگردانییە.

**جەنجەڕە** (باک.): جەنجەڕ، تەوری چکۆڵە.

**جەنجەڕەوان:** ئەوکەسەیە، کە دەغڵی بەجەنجەڕگێرە دەکا ودەیکوتێ.

**جەندەرە** (باک.): تەنگانە، سەرگەردانی. ئەم کەتین ــ یی: ئێمە کەوتینە ناوتەنگانەو سەرگەردانی. (زا.) چتێکە چتی تەنراوی پێ دەق دەکرێ.

**جەندەک:** تەرم، لاشە، لاک.

**جەندخەوون** (باک.): خەیاڵ، ڕەشانک، تارمایی.

**جەندک** (باک.): لاجانگ، نێوانی گوێچکە و چاو.

**جەندیلە** (هەو.): کوندە یێکی ئاوێیە لە پێستی کاریلە و بەرخان دروست دەکرێ و قامیشێکیشی تیدەخرێ تا کاروانچی و سەپانان ئاوی پێ بخۆنەوە. (دزە.) جەوەندە.

**جەنزیر** (باک.): ژەنک. زنجیر.

**جەنقاندن** (باک.): ترساندن.

**جەنقین** (باک.): ترسان.

**جەنگ:** شەڕ، کێشە، بەگژ یەکتریدا چوونی دوو کەسانە یا پتر، هەرا. دەمەقاڵە، دوژمنایەتی. ــ کردن: شەڕکردن.

**جەنگانی** (هەورا.): شەڕکەر، شەڕفرۆش. جەنگاوەر، جەنگکار، (جەنگ کەر).

**جەنگاوەر:** شەڕانی، شەڕکەر، شەڕفرۆش. جەنگانی، جەنگکار، (جەنگ کەر)، نێوی نێرینانە . ــ ی: شەڕکەری، (هەورا.) جەنگانی.

**جەنگە:** کات، گەرمە، هەڕەت، کانگە، ناوەڕاست. ــ ی گولانە: کانگەی گولانە.

**جەنگەڵ:** دارودەوەن، دەوەن، بێشەلان، دارستان، لێڕەوار، لێڕ، چڕە، شەخەڵ. جەنگڵستان، دارستانی چڕ. ــ ی: چت و زیندەواری جەنگەڵی. تووڕە، قەڵس.

**جەنگەڵستان:** دارستان، لێڕەوار، لێڕ، دارستانی چڕ.

**جەنگەنە** (باک.): جینگەنە. کەسێکە چتی خراپی پێ نەنگ نەبێ.

**جەنگڕان:** شەڕکەر، شیرکرۆژ. ــ ی: شەڕکەری، شیرکرۆژی.

**جەنگ زەڕکڕی:** شەڕی دەسکرد.

**جەنگ شوناس:** جەنگ ناس، پسپۆڕی شەڕ. ــ ی: پسپۆڕێتی شەڕێ.

**جەنگ کەشتی** (باک.): کەشتی جەنگی.

**جەنگ گا:** شەڕگە.

**جەنگ ناس:** جەنگ شوناس

**جەنگی:** شەڕکەر، جەنگاوەر.

**جەنیقاندن** (زا.): ڕەتاندنی گیاندار.

**جەنیقین:** هاژیانی گیاندار.

**جەو** (خۆ.، هەو.، هەورا.، باک.): برینگی ئاژاڵ بڕینەوەیە. (هەورا.) لەوە. ــ دما: لەوەدووا. جۆ، یەو.

**جەواڵ** (موک.): جوواڵ، چاتمە. دەفر، ساک، کورزە، لە تەلیس گەورەترە لە بەن و موو دروستدەکرێ بۆ گواستنەوەی دانەوێڵە. کێشێکە بۆدەغڵ ودان بەکاردەبرێ برێتییە لە دەپووتان، جووا ڵ.

**جەوان** (هەو.): ئاودێر. گۆخڵ. (ئەردە.) جووان.

**جەوە** (فە.): جیوەی داری.

**جەوەر:** جەوەرئاغا ناوی برای قارەمانی کوردستان ئیسماعیل ئاغای سمکۆیە، کەبەفێڵ بانگهێشتی کرابووە تەورێزی ولەوێدا زۆرنامەردانە شەهیدکرا.

**جەوەرە** (ئەردە.): ئاشۆب وسەختی. جەبەرە.

**جەوەنە:** جەوەندە.

**جەوەندە:** جەندیلە، کوندەیێکی ئاوێی گچکەیە بۆ کاروانچی وسەپانان و ئیتر.

**جەوبڕ** (دزە.): برینگ. کەسێکە ئاژەڵی بەبرینگی ببڕێتەوە.

**جەوبڕی**(دزە.، باک.): برینگ کاری، ئاژەڵ بڕینەوە.

**جەوت**: جەفت. قەپووچکەرەقەکانی بەڕوویە، کڵاوی بەڕوو، بۆتاڵدان وخۆشکردن ودەباغی پیستە و چەرم وکوندە و مەشکە و ئیتر بەکاردەبرێت.

**جەوتک**: هەگبەی چەرمین.

**جەوتین**: بە جەوتی دەبغ کراو، چەرم وپێستێکە بەجەوتی خۆشکرابێ.

**جەوجەو** (باک.): جەوجەوک. سەگی پیس وگچکە.

**جەود** (باک.): کوندەی ئاوێیە.

**جەودانە** (بابا.): ڕەنگاوڕەنگ. چەندین ڕەنگی تێکەڵاو.

**جەودک** (باک.): خیگەی چکۆڵە، فیشەک.

**جەوور**: زۆر، خوورت، ئازار، ڕەنج، زرتەجۆیی، ستەم، جەفا، زووخاو. ــ لێ کردن: ئازاردان. ــ لێکراو: ئازاردراو، جەرگبڕاو. (باک.) بیچووە گورگ. بەچکەشێرودڕندەی تر.

**جەوورە**: سەختی، کارەسات.

**جەوورک** (باک.): سەگی جحێڵی ڕاوێیە، کە هێشتا بەکارنەبرابێ.

**جەوز**: چتێکی خڕی کووزکووزی درێژکۆڵەیە لە مازوو گەورەترە. بەری دارێکی گەرمیانییە بۆ گەلێ دەرمانان بەکاردەبرێ.

**جەووز**: (خۆ.): جوورە کەتیرە و جیوەیە، کە لە داری بادام و هەڵووچە وسماق و ئیتر دەردەکەوێ.

**جەوسەق** (زا.): ڕێگایەکە هەمیشە هاتووچۆی پێدا بکرێ.

**جەوسک** (باک.): هاوڕێ، ڕەفتار، ڕێگایە.

**جەوشەن**: زرێ، کراس زرێ.

**جەووک** (باک.): پاساری، جەوی، (زا.) جۆڵا.

**جەوکەر** (باک.): ئەوکەسەیە بەبرینگی ئاژاڵان ببڕێتەوە، برینگەوان، برینگچی.

**جەوکەری**: کاری بڕینەوەی ئاژاڵ بە جەو.

**جەوکری** (باک.): بڕینەوەی ئاژاڵانە بە برینگی.

**جەوکی**: جووک.

**جەوگە** (هەورا.): لەوێ.

**جەوهەر**: شیرە، وێژە، ڕاو. گەوهەر، بەردێکی نرخدارە. هونەر، کارزانی، سەلیقە، کوونە، دژی. بە ــ: هونەرمەند، مەحلان، کارزان، بەسەلیقە، بێ ــ: بێسەلیقە، گێل. زاخ، خاڵ و چەند دێغێکە لە سەردەمی هێندێ تیغی هەڵکەوتوو دەبریسکێتەوە و خۆدەنوێنن، خەنجەری ــ دار بۆ تیغ. بەهەموو جوورە ڕەنگێکی وورد دەڵێن، کە لە قووتووان‌دا لەلای وورده والە فرۆشان دەفرۆشێ. زرنگی ولێهاتن، فیسارەکەس بە ــ و ئاتە زرنگ و لێهاتووە. ــ دار: چتێکە بە جەوهەربێ، کەسێکە زرنگ و لێهاتووبێ، چناری ــ : جوورە چنارێکە. ــ داری: بەجەوهەربی.

**جەوی**: کەتیرە، هەنگووژە، جیوەی دارانە، جیوە لەچەند جوورە گیاو داران پەیدا دەبێ.

**جەوی تۆشی**: جیوەی داری.

**جەوی خشیلک**: جیوەی خوژیلک.

**جەوی گەوەن**: جیوەی گوویێنی.

**جەه** (باک.): جۆ، جێگا، جێ.

**جەهان**: جیهان، دونیا، گێتی. ــ پەنا: تیرەنداز.

**جەهەنەم**: جەهەننەم، جەهەندەم، جەحەندەم، دۆژە، ئارتوون، ئەتوون، ئێتوون، بە دۆژەی گەرماویش دەڵێن.

**جەهەندەم**: جەهەننەم، دۆزەق، دۆزەخ.

**جەهەنەمی**: جەهەننەمی، گۆیا کەسێک لە ڕۆژی پەسلاتێدا لەبەر بەدڕەفتاری و گوناهان دەخرێتە ناو جەهەننەمێ.

**جەهەننەم داش**: مووررووە شینە وەکوو زاخی وایە بۆ وەردێنەی چاو و تەراخوما بۆ گوشتی کرمێ و برینی ئاژالاَن زۆر سوود بەخشە.

**جەهتەر** (باک.): جاترە.

**جەهخووەرک** (زا.): لارەی ناو ئاو.

**جەهداسی** (باک.): جۆی کێوی، جۆداس، (باک.) جەهداسک.

**جەهر** (ئەردە.): ڕق، قین.

**جەهری** (باک.): جوورە نەخۆشییەکە.

**جەهزەر**: (باک.): جۆزەردان، کاتێکە جۆی تێدا دەگاتێ.

**جەهگەنم** (باک.): جوورە دەغلێکە.

**جەهۆک** (باک.): جوورە جۆیەکە.

**جەهیدۆک** (باک.): لەوەندە، گیایەکی بۆنخۆشە.

**جەهیر**: کوڕی جەهیر ئەو کەسەیە، کە وەزارەتی دیاربەکرو دەوڵەتی مەڕوانی دامەزراند، کە نزیکەی سەد ساڵی پتر ژیا لە چیرۆک و مێژووواندا کوڕی جەهیرو مەڕوانی کورد بەناوبانگن.

**جەهوورک** (باک.): کرمی چکۆڵەو سوورە لە ئاوێدا.

**جەهیک** (باک.): هارویی تازە.

**جەهێڵ**: جحێڵ، گەنج، تازە پێگەیشتوو. ــ ی: جحێڵی، گەنجی، لاوی.

**جەهیش**: بە پێی لێکدانەوەی جگەر خووین، ــ لە کێش، گش، گشتک، گشک هاتووە، دەبێژن گشت وەرن واتە هەموو وەرن، پێکەوە وەرن، دروایە بۆ تەگێش و جەیش.

**جەنیک**: کاکۆڵی کوڕانە.

**جبە**: جوورە پاڵتێیەکی داوێندرێژی قۆڵدارە زانایان و داد پرسان و هێندێ پیاوی گەورەی تر لە جیاتی قاپووت و باڵا پۆش لەبەری دەکەن. چەک و تفاقی شەڕ.

جبەخانە

**جبەخانە**: قۆڕخانە، کۆگای چەکی جەنگی.

**جبەیی** (ڕۆژ.): جوورە قاپووتێکی شووانانە تا ئەژنۆیانە، شووان و جووتێران لەبن قاپووتەکەیەوە لەبەردەکەن.

**جبرا**: ئێلێکی کوردە، خالدبەگی جبری لە ١٩٢٥ دا شەهید کرا.

**جبلە** (باک.): کەڵەباب، کەڵەشێر.

**جبۆ** (باد.): ووشەیەکە وەکوو: کابرا، بۆنێرینان بەکاردەبرێت.

**جج**: (باک.): دەنگێکە مەڕی پێ لێدە خوڕن، ییخە، ئیخە، ییخخە، ئیخخە.

جبلە

**ججاڵ:** جەجاڵ، دەجال.

**ججە** (باد.): ووشەییێکە مەڕی پێدەردەکرێ، ییخە، ییخخە.

**جحێڵ:** لاو، گەنج، تۆلاز، لاوک، لاوکۆ، سیپە، جاهێڵ، جایەڵ، خۆرت، جوانکە، خوێنگەرم، (هەورا.) جۆڤۆن، کەسێکە تەمەنی لە نێوانی منداڵی و جاحێڵی دابێ.

**جحێڵانە:** لاوانە، گەنجانە.

**جحێڵایەتی:** گەنجایەتی، تۆلازی، لاوێنی، لاڤانی، لاوێتی.

**جحێڵی:** گەنجی، خۆرتی، لاوی، شاخینی، (هەورا.) جۆڤۆنی.

**جخ** (کە.، خۆ.، ڕەوا.): شاپەڕ، پەڕەهەرەدرێژە، (کە.) ئەگریجە، بسکی کورتکراوەوە.

**جخار** (شار.): داخ، پەرۆش، جەخار، خەفەت.

**جخارە:** جغارە.

**جخارەکێش:** جغارە کێش.

**جخارەکێشان:** جغارەکێشان.

**جخارەکێشی:** جغارە کێشی.

جغارە

**جخەجخە:** تووکی پێشەسەرو نێوچاوانە، کە وەکوو پەرچەم بڕابێتەوە ولەسەر نێوچاوان یا لاڕوومەت ڕاوەستێ.

**جخز:** جەخز، جووز، خەتی ڕاست یا گرد، ـــ لێدان: جەخزکێشان.

**جخل** (دزە.): نەیار، ناحەز، دوژمن.

**جدەو:** جەدەو، برین و کولکێکی پیسە بە هۆی باری گران یا زین یا کورتان لە سەر شانی وولاخان پەیدا دەبێ و یا لە ناو شانی کەلێی پیس کردبێ ـــ ی پێدەلێن، بەڕۆنی هەلزوسانەوە چادەبێتەوە. شکست و عەیبدار. ـــ بوون: عەیبداربوون و لە کار کەوتنی چت. بریندار بوونی پشتی وولاخ لە بەر بار یا زین یا کورتانی.

**جدەوگە:** جێگایەکە لە سەر شانی وولاخان بەلای یالییەوە، کە جدەو بێ.

**جدەوی:** جەدەوی.

**جدی** (باک.): جریت، جلیت.

**جدیدانێ:** جلیتانێ، سوارسوارانێ، کێبڕکێ بە وولاخان.

**جر** (باک.): خوو ڕەووشت، ڕەفتار. سەتڵ، دۆلکە.

**جڕ** (باک.): لە بنچینەدا گرییە، دوژمنایەتی، ڕکەبەرێتی. جووره ووشەییێکە خەڵکی پێ توورە دەکرێ و بۆ گاڵتە پێکردنە جڕ تەڕ ڕۆیشتی، (باد.) هاوردەمی و پێکەوە ڕابواردن، (ئەردە.) جرت. ـــ داهێشتن: جڕتکێشان.

**جڕاجڕ** (باک.): جرتەجرت، دەمەقاڵە لەسەر چتێک.

**جڕە:** چوڕە، جرپە، باڵندەییێکە. (شەم.) کەشاکەش، کێشەکێش.

**جڕەبەگزادە:** باڵندەیێکی جووانی ڕەنگاوڕەنگە بەقەد پۆرێکی دەبێ بەڵام لەو باریکترە، خومە شینکە، خومە ڕێژە.

**جڕەجڕ:** کێشەکێش، کەشاکەش، دەنگی پیسایی کردنی منداڵان و ئیتر.

**جڕبەجڕ:** پارچەپارچە، کوتکوت، پچڕپچڕ. ـــ کردن: پچڕپچڕکردن.

**جڕبۆ** (ڕۆژ.): ووشەیەکە بۆ توورە و قەڵس کردنی بەرازان بەکاردەبرێ.

**جڕبۆزە:** ووتەییێکە بەرازی پێ لەکون دەردەپەڕێنرێ بۆ ڕاوکردنی.

**جڕپن:** برۆز، برۆک، سووک. ـــ ی: برۆزی، سووکی.

**جرت:** جرت، مرۆی هەرزە.

**جرت:** زرت، ترکەندن بەدەم. ـــ لێدان: زرت لێدان، جرتاندن، بەزار زرت کێشان.

**جرتاندن:** زرتکێشان، جرتلێدان.

**جرتاو:** جەرەتاو.

**جرتە** (ڕۆژ.): بەزاری ترکەندن. خەرقە، سەرکەوا، پاڵتۆی شڕ.

**جرتەجرت:** بۆڵە بۆڵ، پرتەپرت، منەت. ـــ لەسەرکردن: منەت لەسەرکردن. جووره ڕۆیشتنێکیشە، بەزاری ترکردن.

**جرتەکردن:** بزێوی و جرپنی کردن.

**جرت و پرت:** جرت و فرت، جرت و پەرت، بۆڵە بۆڵ، چەنەلێدان.

**جرت و فرت:** چەنەلێدان، جرت و پرت، هات و چۆو پەلە پەلی بەبێ جێ، ـــ کردن: هاتووچۆو جرتەجرت کردن.

**جرجب:** ڕووبارێکە لە ڕۆژاوای شاری ماردینێ دەردەکەوێ.

**جرج** (هەورا.): رزک، ڕزق، ڕسق، (زەن.) ڕسک، (باڵە.) بانەوانک، بانبانک، فاتە ڕەشک، وەکوو مشکی وایە بەلاَن زۆر گەورەترە.

**جرجە کوویرە:** خەڵەتکۆر، مشکەکوویرە، کەم دەبینرێ لە چۆڵ و دەشت لە زەویدا بە کۆمەڵ خۆڵی هەڵدەداتەوە.

**جرجرە** (ئەردە.): بەرزە جرە، سرسرە.

**جرجونگانێ** (ئەردە.): مەردومی توورەو ترۆ، کەسێکە زوو توورەبێ.

**جرجینکانێ** (ئەردە.): جرجونگانێ.

**جرد** (باک.): جلیت، جریت، (باد.) جرج.

جرج

**جرداهێشتن:** زرتکێشان بەزار.

**جرز** (ئەردە.): سووچ، گۆشە، ڕاوێژی ڕووەکییە.

**جرقە:** پرشە، پروسکە، پزوسکە، پریشکی ئاووری.

**جرقۆ بەس** (باک.): جووره شەکرۆکەیەکە، لە شەکری تواوەوە و سپێنەی هێلکەی دروستدەکرێ.

**جرک** (باک.): گیایەکە.

**جرم** (ئەردە.): تلف، تلفار، سلف، تلتەی چتی کوشراوو ئیتر. خلتەییێکە لەبنی ئاوو قاپ و چتیتر دەنیشێ. (ئەردە.) مارسایی، بارستایی.

**جرناو فرنا:** جرنا و فرنا، (کە.) چتی پڕو پووچ، چەوساندنەوەی کەسێکی بەچەشنێکی پڕو پووچ.

**جرناوەر** (باک.): جانەوەر.

**جرنگاندن:** زرنگە لە پوول و چتیتر هێنان، پارە یا چتێکیتر دان بە شێوەیە کی وا کە، لە دڵ گران بێ.

**جرنگە:** زرنگەی پوول و کانانی تر.

**جرنگەجرنگ:** زرنگەزرنگی پارەیەک لە دووای یەکتری.

**جرنیفرنیا** (هەو.): چتی پڕوپووچ، جرنا فرنا.

**جڕوجانەوەر:** زیندەوارو جانەوەران، جلکی شڕ، پروپیتی بێ کەڵک.

**جرو جۆپ:** جرت و فرت.

**جرو جیاز:** پڕو پیتی ناوماڵ.

**جرو جیازی:** جرو جیاز.

**جرووسکە:** ترووسکە.

**جرووکە:** جووکە، جریوە، دەنگی پەڕەووری گچکەو مشکییە.

**جرووکە جرووک:** جووکە جووک، جیکەو زرووکەی مشک و ئیتر.

**جرووکۆمی** (باک.): دەنگە دەنگ، هەراهەرا.

**جرها** (ئەردە.): جڕ، شڕها، بۆ قەشمەری پێکردن بەکاردەبرێ.

**جرهاتن** (ئەردە.): تەنگەتاو بوون، پەست بوون.

**جریب:** جریو، گاوەخان.

**جریت:** (باک.) جرید، جدی، جرد، جلیت.

**جریتان:** جلیتێن، جریتبازی، تەقڵەداکوتان.

**جریتباز:** جلیتکار.

**جریتبازی:** جلیتێن، یاری و غار کردن بە ئەسپ.

**جریتێن:** جریتان، جلیتان، جلیت بازی.

**جرید:** (باک.) جریت.

**جریفک** (باک.): گەسک.

**جریکە** (ئەردە.): جرووکە، جریوە، زرووکە.

**جریکەجریک:** جرووکەجرووک.

**جریو:** جریب.

**جریوە:** جیکە، زریوە، سریوە، دەنگی پەڕەووری گچکەیە، جرووکە، سریوەی ئەستێران و جوولانەوەیان لە پێش چاوان.

**جریوەجریو:** دەنگی چۆلەکەو پەڕەوری گچکەیە، سریوە، جیوەجیو، جیکەجیک، جلوە، وورشە، سریوەسریو، زریوەزریو، وورشەوورش، بۆ گرشە گرشی ئەستێرانیش بەکاردەبرێت.

**جز** (باک.): جزوو، جلْد، بەرگ. (ڕۆژ.) چزەی گۆشت و چەورییە لە سەر ئاووری، چزەی کانی سوورکراوەوەیە، کە لە ناو ئاوی سارد هەڵکێشری.

**جزار** (باک.): بێگار، ڕەنج، ئازار، ـــ دان: ئازاردان، ـــ کرن: ئازاردان. (باک.) پارچە.

**جزال جزال** (باک.): پارچە پارچە.

**جزە:** لە زاراوەی منداڵانی ساوادا بە گۆشتی دەڵێن.

**جززە:** جزە.

**جزخ:** جەزخ.

جزدان

**جزدان:** کیسەی پووڵییە لە قایش و نایلۆن و چتیتر دروستدەکرێ.

**جزم:** بەشێکی تایبەتی و سەربەخۆیە لە پەرتووک یا نووسراوێکی زۆر، بەند.

**جزمە** (ع.): چەکمە (تورکییە)، مارنەگەز، پێڵاوێکی لاسک درێژی چەرمین یا لاستیکی زستانییە وەکوو چەکمە وایە.

**جزووبەند:** لێکدروونی بنی بەندەکانی پەرتووکان و لە بەرگ گرتنی.

**جزوبز:** چزو فز، خەزو بەز، چتی قەڵەو چەوور.

**جزوفز:** فەزوبەز، جزوبز، قەڵەو و چەوور.

**جزیر:** گزیرە، دەشت و چۆلێکی وایە ناکێلرێ و کشت وکاڵی لێناکرێ لە نێو دوو زەوی وا دا، کەکشت و کاڵی لێبکرێ.

**جزوێن** (شێخ.): جنێو.

**جستان:** (کە.) زستان.

**جسن:** ڕەگەز چاک.

**جسووجۆ:** جست و جۆ، گەڕان بەدوای چتێکدا. ـــ کردن: گەڕان بە دوای چتێکدا.

**جعەتنی:** جعێتنی، جوورێکە لە نەتەوەو ڕەسەنی ئەسپ و ماین، وەکوو کەحێلە، سەگلاوی عوبەیدە.

**جعێتنی:** جوورە وولاخێکی بەرزی ڕەسەنە.

**جعیدۆک** (زا.): گیایەکی بۆنخۆشە دەخرێتە ناو جلوبەرگو کالاوە تا مۆرانەی لێنەدات.

**جغ** (باک.): دەنگی بەردانی گوێلک و بێچووی ئاژاڵ و ماڵاتانەو پێی دەردەکرێ.

**جغ جغ:** گوێلک وبێچووی ماڵات و ئاژاڵانی پێدەر دەکرێ.

**جغارە:** جگەرە، جگار، سیغار، سیگار، جخارە، پزپزۆک.

**جغارەچی:** جگەرەفرۆش. ـــ ی: جگەرە خۆر.

**جغارە خۆری:** جگەرە خوواردن.

**جغارەکێش:** جگەرە خۆر.

**جغارەکێشان:** جگەرەکێشان.

**جغارەکێشی:** جگەرەکێشان.

**جغە:** جخە، پێشەسەر و نێوچاوان، کەمووی بیڕێتەوە وەکوو پەرچەم ڕاوەستێ.

**جغەرە:** جغارە، سیغار، سیگارە.

**جغەرەچی:** جغارە فرۆش.

**جغەرە خۆر:** جغارە کێش.

**جغەرە خۆری:** جغارە کێشان.

**جغەرە فرۆش:** جغارە فرۆش.

**جغەرە کێش:** جغارە خۆر.

**جغەرە کێشان:** جغارە کێشان.

**جغجغە** (موک.): جوورە ترێیەکە گلووی هێندەی دەنکی ئالووبالوویەکییە و ڕەشەو دەنکی هەیە بۆ میلاق دەستدەدات.

**جغز:** جەغز، جووز، شخت، (باک.) تار، گێڕێکی گردە لە یاری جەغزێنێدا دەستەی تێکەوتوو دەچنە ناوییەوە.

**جغزێن:** جوورە گەمەیێکی دوو چینییە جەغزێکی دەکێشن هەر چینێکی تێکەوێت دەبێ بچێتە ناوییەوە و دەستەکەی تر لە دەرەوە تۆپی تێدەگرن.

**جفت:** دوران، جووت. ـــ ی کەوش. ـــ ی گۆڕەوی ئەوەیە، کەتاک نەبێ. ـــ کشت و کاڵ، زەوی کێلان، شێڤ، گاجفت، گاجووت، هۆگر، لیکیاگ، لایەک. ـــ بوون: جووتبوون، جەوت، (ئەردە.) جوور، لف، وەک یەک.

**جفتبوون:** لکنان، چەسپیان، لفگرتن، پێکگەیشتن، جووتبوون.

**جفتکردن:** جووتکردن، چەسپان. جوتکردن، زەوی کێلان، شێوکردن.

**جفته** (دەر. ، فە.): جووتە، لەقە، لووشکەیە بەدوو پاشووان، (ئەردە.) دووباڵندەی نێرو مێن هەریەکەی باڵێکیان هەیەلەسەر زەوی جودا دەبنەوە و لە حەوا جووت دەبن. ماشەیێکی گچکەو کورتی نووک باریکەپیشەگەران بەکاری دەبەن وەکوو زێڕینگەر وکەڤمێرساز و پیتچینی چاپخانان و ئیتر.

**جفته قزمیر**: جوورە چۆغەیێکی تەنکی سفتی ساخە.

**جفتەوانە**: (زەن.): ئەستێرەیەکە، جووتێر، جووتیار.

**جفتەوەشاندن**: جووتەوەشاندنی وولاغ.

**جفتەوەشان**: جووتە وەشاندن.

**جفتە وەشێن**: جووتە وەشێن، لەقەوەشێن.

**جفتە هەڵخستن**: جووتەوەشاندن.

**جفتی**: جووتی، هاوەدەنگی، گۆزانییێکە، کە پێکەوەی بڵێن. (فە.) دووزەلە.

**جفتیار**: جووتیار، بکێڵ، جووتکار، وەرزێر.

**جفات** (باک.): کۆمەڵە، پارت، کۆمەگ، ئەنجومەن.

**جفاتی** (باک.): کۆمەڵایەتی.

**جفان** (باک.): کۆمەڵبەستن، پەیان، پەیمانگە.

**جفاندن** (شەم. ، شکا. ، باک.): کۆمەڵەکۆکردنەوە، خڕکردنەوە، کۆکردنەوە.

**جفانگەهـ** (باک.): کۆڕ، دانیشتگە، کۆمەڵگە.

**جفانۆک** (باک.): کۆمەڵۆک، کۆمەڵەیەکی گچکە.

**جفرە** (باک.): جوورە باز یا سەقرێکە.

**جفراندن** (باک.): ترساندن، زراوبردن.

**جفلین** (باک.): کەوولکردن، پێست لێکردنەوە.

**جفنین** (باک.): بەستران لە ترسان، (باک.) جنێو.

**جفۆنی** (هەورا.): جووانی، جحێڵی.

**جفیان** (باک.): کۆبوونەوە.

**جفین** (باک. ، شەم. ، باد.): کۆبوونەوە، جڤان.

**جفینگ**: جڤینگە، شوێنی کۆبوونەوە.

**جفینۆک** (باک. ، سوور.): دانیشتگە، نیشتگە.

**جق** (ئەردە.): تام، مەزە، بەڵام هەمیشە بە دووای ووشەی شیرینەوە دەنووسێ: شیرینجق، شیرین مەزە.

**جقاندن** (ڕۆژ.): قیراندنی بۆق و باڵندان.

**جقە**: جوورە چۆلەکەیەکی بۆرەڵووکەیە لە پاساری کەمێک گەورەترە و جقەدارە واتە تاجی هەیە، کە هەڵفڕێ زۆر ناڕوات دەنیشێتەوە بەزۆری لە سەر ڕێگایاندا. برێتییە لەو قامکەڕاستەی، کەلە پێی کەڵەباب دەردێ لە ژووررووی پەنجەکانیەوەکە (خرت) بوو. پەڕێکی جووانی تاووس و ئیترە گەورە پیاوان لە سەرپێچی خۆیانی دەدەن، نیشان، تاج: چەند پەڕێکی قیت و قنجە بەسەرسەری هەندێ پەلەووڕانەوە. (ئەردە.) گوڵی بادامییە، لیس، جێگەی مەل و باڵندە و مریشک، زریوە و جریوەی چۆلەکەو ئیتر، گوڵبادام، نکاندن لە ژێر کۆڵ و باری گراندا، (مەلیش.) مەنجەڵ.

**جقە تۆرە** (ڕۆژ.): سیکە تۆرەی باڵندەو ئیتر.

**جقەجق** (ڕۆژ.): قرتەقرتی مریشکان، قیرەقیری بۆقان و مریشکانە بۆ بێچووەکانیان.

**جقەشینە** (دەر.): بەفرەشینە، (موک.) کاسەڵە شینکە، باڵندەیێکە.

**جقجقاندن** (باک.): ڕاوەشاندن.

**جقجقین** (باک.): ڕاوەشان.

**جک** (ئەردە.): میچ، قاپ، جگ. (موک.) جگ لەکاتی جگێنیدا، کە بەسەر لابەرینە قۆقزە چاڵەکەی دابکەوێ و لالووس و بەرینەکەی لەسەرەوەبێ ـ ی پێدەڵێن.

**جکاندن**: جیکەکردنی مریشک.

**جکەجک**: جیکەجیکی مریشک.

**جگ**: (باک.) قاپ، قابک، (بابا.) مێچ، میچ، (باک.) کاپ، قاپ، چوو. بەدیوە چاڵەکەی جگی دەڵێن.

**جگارە**: سیغار، جغارە، جخارە.

**جگارەخۆر**: جغارەکێش. ـ ی: خغارە کێشی.

**جگارە فرۆش**: جغارە فرۆشی.

**جگارەکێش**: جغارەکێش.

**جگارەکێشان**: جغارە کێشان.

**جگارە کێشی**: جغارە کێشی.

**جگانێ**: مێچێن، جگێن.

**جگە**: بێ، بێجگە، بێلە، ژبلی، جودا، جیاواز، ـــ کردنەوە، جودا کردنەوە.

**جگەر**(ڕۆژ. ، بابا.): جەرگ. ڕۆڵەی مرۆڤان.

**جگەر ئۆتی**: گیایەکە جۆش دەدرێ و بۆ کۆکە و ژانەزگ دەخورێتەوە.

**جگەرە** (هەورا.): جغارە، سیغار، جخارە.

**جگەرەچی**: جغارە فرۆش.

**جگەرە خۆر**: جغارەکێش. ـ ی: جغارە خوواردن.

**جگەرەکێش**: جغارە خۆر.

**جگەرە کێشان**: (هەورا.) جگەرە کێشای.

**جگەرە کێشەی**: جغارە کێشان.

**جگەرە کێشتەی** (هەورا.): جغارە کێشان.

**جگەرەکێشی**: جغارە کێشان.

**جگەرچی**: جەرگبرژێن، جەرگفرۆش.

**جگەرخووێن**: جەرگ خووێن، بڕوانە: جەگەر خوون.

**جگەر دۆڵمە**: (ئەردە.) مووار، دۆڵمەجەرگ.

**جگەرسووتان**: مردنی ڕۆڵەی جگەر گۆشە.

**جگەرسووتاندن**: مراندن یا کوژتنی منداڵی جیگەر گۆشە.

**جگەرسووتاو**: برێتییە لە کەسێک، کە ڕۆڵەی مردبێ.

**جگەرسۆز**: دڵسۆز، یەکێکە، کە بەتەنگ کەسێکیترەوە بێ و زگی پێی بسووتێ، جەرگسۆز، میهرەبان. ـــ ی: دڵسۆزی، جەرگسۆزی، میهرەبانی.

**جگەرگۆشە:** فرزەنـد، منداڵـی خۆشەویسـت، ڕۆڵـەی مەردوم سا کوڕ بێ یا کچ، خۆشەویستی دڵ.

جل و بەرگ

**جگەروسی:** جەرگ و هەناو.

**جگمە** (ڕەوا.، هـەو.): جێگایەکـە لـە نێوئـەندامی مرۆیاندا، کە جگی تێدایە.(هەو.) جومگە، گرێی بازنەی دستییە.(هەورا.) زگماک.

**جگتی** (باک.): قاپی گەورە، جگی گەورە.

**جگێن:** میچێن، جگانێ، قاپانە، میچ میچێن.

**جل:** بەرگ، جلک، پۆشاک، پۆشەمەنی، (هەورا.) کنج، جلـێ. ـــ لـەبەر کردن: جل لخووەکرن. ـــ داکەندن: جل ژخووەکرن. پەلاسێکە لـە پشتی وولاخان و ڕەشە وولاخان و چارەوا و تاجی دەکرێت لـەسەرمان.

**جلال** (باک.): خڕ، جۆگەی خڕ.

**جلە:** (بڵ.) ڕەقەی گەورەیە، سێڵە، زۆر لەڕەقەی گەورەترە. زیندەوارێکی ئاوییە لـە ناو ئاوێ خۆی پاندەکاتەوە بۆ گرتنی مـلێ و مووشـو دووایە خۆی وێک دێنێتەوە و مل و مووشەکان قووت دەدات. ترترە: گیایەکە لە نێو وێنجەیدا شین دەبێ پنجەو ڕیشوو ڕیشوو قـۆڵ قـۆڵ دەکشێ و بێ گەڵایەو وێنجەی ووشک دەکات.

**جڵە:** چاو لـە دوویی، قرم، ئاژوەری.

**جلەسپ:** جلی ئەسپ.

**جلە شرە:** گیایەکی ئاوییە وەک بەرە بەسەر ئاوێدا پاندەبێتەوە، جلە.

**جڵەو:** دەسـتـەڕەشمە، دانـەلغاو، جەڵـەو، هەوسـار، هەفسـار، قەوچـە، دەستەجڵەو، دەستەجەڵەو. کۆمەڵە ئاژاڵێکە.

**جڵەودار:** سەرۆکی کاروان.

**جڵەوداری:** جڵەوکێشی.

**جڵەو سووراندنەوە:** (باک.) پاشیاو خووەدان.

**جڵەوشلکردن:** بریتیـە لـە بـەرەڵاکردنی منـداڵ و بەردەست و زۆر گـوێ نەدانیان.

**جڵەو شۆڕ کردنەوە:** داندن.

**جڵەوکێش:** جڵەودار، سەردەستە، سەرکێش.

**جڵەوکێشان:** ڕاکێشانی جڵەوی وولاخ.

**جڵەوگیر:** یەکێکـە پێشـگیری یـا جڵـەو گـیری کەسـێکی بکـات، بەربەسکار.

**جڵەوگیری:** مەبەس ڕێنەدانە بۆ کردن و یا ووتنی چتێک، بەربەستکردن، ـــ ی ئازادی بکە لە هاوڕێی بەد و خراپ.

**جڵەو هەڵتەکاندن:** جڵـەو جوولانـدن و ڕاتـەکاندن، جڵـەو هەڵکێشـان، جڵەوگرتن.

**جڵەو هەڵکێشان:** جڵەوتوندو گورجکردن، جڵەو هەڵتەکاندن.

**جلبەنی** (ئەردە.): جانتا، جلبەندی.

**جلبڕ:** بڕوانە: جلبڕۆکە. بەرگدروو، کەسێکە، کە بەرگ و جلی بـۆ خـەڵکی ببڕێ.

**جلبڕان** (ئەردە.): جلبڕین، کوڕی جلبڕین.

**جلبڕۆکە** (کۆ.): مزرۆکە، جلبڕ، چێشـتێکەلە پیـازو تـرش و هێلکـە دروستدەکرێ.

**جلبڕین:** بانگهێشتنێکی تێکڕایی ژنانە لەلایەن مـاڵی بووکـەوە بەبۆنـەی بڕینی جلی بووکێ.

**جل پۆش:** بەرگ پۆشی.

**جلپۆشی:** بەرگ پۆشی.

**جلخووار:** جلشۆڕ. ـــ ی: جلشۆڕی.

**جلدان:** چارۆکەی کۆڵی ژنانە.

**جلدانک** (باک.): کانتۆر.

**جلدروو:** بەرگدروو.

**جلدروون:** بەرگدروون.

**جلڕەش:** ڕەشپۆش. ـــ ی: ڕەشپۆشی.

**جلشتن:** جل و بەرگ و کەلو پەل شوشتن.

**جلشۆ** (باک.): جلشۆر.

**جلشۆر** (هەورا.): کوتکی جلشوشتنێ، (هەورا.) دارکوتک. (باک.) بەرگشـۆر، شوشـتڤان، جلشـۆ، گازر، کەسێکە جلکـی چڵکن بشـووات.

**جلشۆڕ:** جـل خووار، کەسێکە ئـارەوانی خوشبووێ، کـە بەرامبـەر جاشـی ئەمڕۆیە. ـــ ی: جلشۆڕی، ئارەب خۆ شەویستن.

**جل شۆرک:** شوێنێکە بەرگ و کالای تێدا دەشورێ.

**جلشۆرک:** کوتکی جلشوشتنی، گەلاکوتک.

**جل شوشتن:** شیوکردن، کۆڵکردن.

**جڵف** (ئەردە.): هەرزە، سووکی، قرت.

**جلفـڕ:** جرپـن، چنـۆک، ئەوکەسـەیە وەدووی هـەمـوو چتێـک و هـەمـوو کەسێکی بکەوێ. مرۆی پیسکەو قۆڕ.

**جلق** (بـاک.): قـیرۆزفت، بـارام بـو بـە جلـق ژمـن قـەنابێ. میـوەی زۆر گەیشتوو.

**جلق:** ناوی جوورە پارەیێکی کەم نرخ بووە.

**جلقاو** (ئەردە.): چڵکاو، پاشاراو.

**جلک:** بەرگ، پۆشاک، کنج، (هەورا.) بەلک، جلێ.

**جلکار:** بەرگی کارێ، جلێکی تەنها لە کاتی کار کردنێدا بەکار دەبرێ.

**جلکدروو:** بەرگدروو.

**جلکدروون:** بەرگدروون.

**جلفی** (باک.): ناوی جوورە ئەسپێکییە لـە جزیروبۆتانی پەیدا دەبێ.

**جلکا:** جوورە ماسییەکە. جلی گاجووتانە.

**جلکە:** دەشت و چۆل، سارا.

**جلگۆڕین:** ئەجیبلۆسک.

**جلوە** (باک.): جیلوە، عیشوە، نمایش.

**جل و بەرگ:** پۆشاک.

**جلو جۆر:** کەل و پەلی ناو ماڵ. جل و توورەکەی وولاخان.

**جل و مل:** بەرگ و مەرگ، ڕەخت و پەخت.

**جل ووراز** (هەورا.): جلدروو.

**جلهان**: گیایەکە.

**جلیّ** (هەورا.): بەرگ، جلک.

**جلیت**: داریّکی دریّژە سوواران جلیتیّن و جلیتبازییان پیّدەکرد. جریت، جرد.

**جلیتانیّ**: جلیتیّن.

**جلیتاو**: شلّتاو، لوّخ.

**جلیتباز**: کەسیّکە یاری جلیتیّنی باش بزانیّ.

**جلیتبازی**: جلیتیّن، زانینی یاری جلیتیّن.

**جلیتیّن**: جلیتبازیکردن بەسەر سوواریییەوە، جلیتبازی، دارجلیتین.

**جلیّجیلی**: چەکچەکیلە.

**جلیسقە**: سیخمە، سینە پۆش.

**جم**: (ڕۆژ.) جوولّە، جوولاّن، بزووتن. (ڕۆژ.) گشت، هەموو، جومگە، جومژگە.

**جمان**: جوولاّن، خوویّن ـــ: خوویّن بزووتن، کەوتنە ڕیّ. (ڕەوا.) جنیّو.

**جماندن**: جوولاندن، بزواندن، بزاوتن، ڕوواندن، وەڕیّخستن.

**جمانن** (فە.): جماندن.

**جمە**: ووتەیەکە بەکاردەهیّنریّ بۆ کۆبوونەوە و بەسەریەکدا کەوتنی مەردوم لە شوویّنیّکدا؛ ئیمڕۆ بازاڕ ـــ ی دەهات.

**جمەجم** (هەورا.): جوولّە جوولّ، هووژە، جوولّە، جمس.

**جمجمە**: جومجومەی سەری، کاسەی سەر.

**جمخار** (باک.): زەنگی کلیسایە.

**جمدان**: جوولاّن بەتەکانەوە.

**جمژگە**: جومگە، مەچی دەست.

**جمژگە**: دووانە.

**جمس** (ئەردە.): جوولّە.

**جمشرگ** (ئەردە.): مەچەک.

**جمک**: دووانەی منداڵ یا هەر گیانداریّکی تر، ئاوزیّ، جمکە، ئاوزە، هەڤالْزا، لڤانە، هەڤالجیّوک.

**جمکانە** (هەو.): جمک، دووانە.

**جمکە** (بل.): دووانە، جمک، بۆ مرۆڤ و مالاّتان.

**جمکوت**: جەنجاڵ، شوویّنی پڕ و جەنجاڵ. چتیّکە چیّو ئاخنکرابیّ، چیّوکوت.

**جمگە**: (هەورا.) جومگە، خرتک، جومشگە، (ڕەوا.) جگمە، مەچی دەست، جیّگای جوولاّن. پارچەی چت.

**جمگەئیّشە**: دەردی مەچەک.

**جمگەجمگە**: چتی کوتکوت، بەن بەن، بەنگبەنگە، بورجم بورجوم.

**جمگەماسای** (هەورا.): جومگە ئاوروسان.

**جمە**: جمە.

**جم و جوولّ**: جوولّەجوولّ، جمە، جوولّە. جوولاّن.

**جمیان**: جمان.

**جمین** (فە.): جمان، جوولاّن، ڕۆیشتن. (خۆ.) جنیّو.

**جن**: جنۆکە، قژنەسەرە، درنج، عەجنە، بیّگانان بە کوردی بە جنەوییان کوتووە جن یا جن، هەمیشە کوردی وە دیّو و درنج چوواندووە.

**جناخ**: (فە.) ئیّسکی چۆلّە میّشکیّنەیە. ـــ شکاندن: چۆلّە میّشکیّنەکردن.

**جناخە**: کرمەک، ژیّر چەناخە، چتیّکە لە قەیتان یا لە زیّڕ و ئیتر بە ژیّرچەنەگەدا ڕایەلّ دەکریّ و هەردووک سەری بە قولاپ لە کلاّوی ژنان بەند دەکریّ.

**جنارە** (ڕەوا.): قوونیّریّکی دریّژە لە سەر ڕەفیسکە و دەماری ڕەفیسکەی دیّ، (هەر.) خیارۆک.

**جناندن** (ڕۆژ.): ئەنجنین، جنین، ووردکردن بۆ گۆشت و سەوزەوات و ئیتر.

**جنانراو** (ڕۆژ.): ئەنجنراو، ووردکراو.

**جناوەر**: (باک.): جانەوەر.

**جنە**: جننە، جندە، لەوەن، حەشەری، سووزمانی، گاندەر، حیز، سازندە.

**جنەباز**: ژنباز، جندەباز. ـــ ی: ژنبازی، جندەبازی.

**جنەخانە**: سازندەخانە، حیزخانە.

**جنەشارەوشار**: شارانگەڕ.

**جنەنار** (کە.): جن هەنار، (کە.) داریّکی کیّوی و درواوییە وە دارە هەناری دەچیّ.

**جنهەری** (باک.): جنۆکەی میّیینە.

**جنجر**: بروانە: جنجر، خالّخالّ، پنک پنک، بالّندەی دوو یا چەندین ڕەنگە.

**جنجروّک**: (هەو.) چنگورک، بەنینۆکی ڕنین و لیّدان.

**جنجلی** (باک.): پاک و خاویّن.

**جنجیر**: خالّخالّ و پەلّە پەلاّوی، جنجر، چیل، کونج، بالّندەییّکی دوو یا چەندین ڕەنگی پەلّە پەلاّوییە.

**جنچک**: پل، جنچکەگۆشتیّک: پلە گۆشتیّک. ناوک و دەنکی میوەیە، جینچکە.

**جنچکان**: (ئەردە.): هەلّتووتان بە چیچکانەوە واتە سەرپیّیان هەلّتروشکان. قنچکان، هەلّتووتیان، کزکوولّە، دون، لەسەر پیّیان هەلّترووشکان.

**جنچکە** (ئەردە.): جنچکان.

**جنکە** (ئەردە.): ئنجە، پل، پلە گۆشت و ئیتر.

**جندار**: جنۆکەدار، کەسیّکە شیّت و جنۆکەداربیّ. ـــ ی: جنۆکەداری.

**جندە**: جنە، ئافرەتی سووزانی و حەشەری، سووزمانی، حیز، ژنی حیز، (ڕەوا.) فەلّتۆیی، فەلهیتە، فلار.

**جندەباز**: جننەباز، پیاویّکە بە شوویّن ئافرەتی حیزدا بخولیّتەوە.

**جندەبازی**: جننە بازی کردن.

**جندەخانە**: جننەخانە.

**جندەیی**: سۆزمانیّتی، جندییّتی، حیزی.

**جندۆکە:** جوورە گیـاندارێکی نادیـارو وونـە گۆیـا هیـچ نـابینرێ، جنۆکـە، خێو، دیوەڵۆکە، (باک.) جن.

**جندۆکەدار:** جندار، شێت. ـــ ی: جنداری، شێتی.

**جنراو:** ئەنجنراو، چتێکە بە چەقۆو تیغ وورد کرابێ.

**جنقاندن:** (باک.) جەنقاندن، ترساندن.

**جنقین** (باک.): جەنقین، ترسان.

**جنکە** (ئەردە.): ڕێزەییێک لەچتێک.

**جنگـە:** پرتە.

**جنگـەجنگ:** پرتەپرت، ناوی دەنگییە، زرینگە، ناوی دەنگی دراوییە.

**جنگدان:** جمدان.

**جنگـز:** مرۆی توورەوتوند، جینگەنە. ـ ی: توورەیی.

**جنگن:** جنگز.

**جنگو جوول:** جم و جوولّ.

**جنۆکە:** جندۆکە، جن، عەجنە، درنج، قژنەسەرە.

**جنۆکەدار:** جندۆکەدار. ـــ ی: جندۆکەداری.

**جنهەنار:** جنەنار.

**جنی:** (هەورا.) جننی، جندۆکە.

**جنیاگ:** جنراو، ئەنجنراو.

**جنێک:** مێشەو چنارستان، (هەورا.) بێشە، وێشە.

**جنیک** (زاخ.): لاجانگ.

**جنین:** ووردکردنی چت بە تیغ و ئەنجنین.

**جنێو:** جوون، ووتەی ناشیرین بە یەکێک کوتن، (شێخ.) جژوێن، (دەر.) بیسکاری، (باک.) بیسکانی، (هەو.) جوون، (هەورا.) دوشمەنی، دژمین، (بابا.) جووێن، (زا. یە.) خەبەر، جمین، دوشمین، سخێف، ـــ بدە: بچێرە.

**جنێو پێدان:** قسەپێگوتن.

**جنێو پێدران:** پێکران، ئابڕووبران.

**جنێودان:** ووتەی ناشیرین ووتن، گەزارە کێشان، ڤییین.

**جنێوفرۆش:** جنێودەر، دوژنکە، شەڕفرۆش، کەسێکە زاری شڕبێ و زۆر جنێوی بدات.

**جنێو فرۆشی:** شەڕ فرۆشی، زمان شڕی.

**جۆ:** جوورە دەخڵێکە وەکوو گەنم وایە، بەڵام زبرو گەورەترە بەمزۆری لەگەڵ کای دەدرێ بە ئاژاڵ و وولاخان، (باک.) جەهـ، جەهە، (زەن.) یەو، (هەورا.) یەوی، یەڤە، یەوەی، (دەر.) جووێ، (باک.) جۆک. جۆ سێ جوورە: جۆی سپی، جۆی ڕەش، جۆی شەشپەر، ئەمەیان گوڵەکەی هەشت ڕێزە دەنکی تێدایە. بۆ ئاگاداری بڕوانە: جۆی سپی، ئاوەکەی بۆ سوورێژەک و ئاوبەندو نەخۆشی گورچیلە زۆر باشە. (هەورا.) جۆگە، (باک.) جۆگەلە. (فە.) جو.

جۆبرکە

**جۆبار** (ئەردە.): جۆگە.

**جۆبرکە** (فە.، هەو.): (دزە.) مڵە، وورە.

**جۆپینگین** (باک.): بێ ئایین، بێشێواز، چاو لە دووی ژنان.

**جۆت** (باک.): جووت، جووتیاری. ـــ کردن: جووتکردن، زەوی کێڵان. (باک) جووت، زو، جۆتەک ژن، جۆتەک مێر.

جۆت

**جۆتاری** (باک.): جووتیاری، (باک.) جۆتکاری.

**جۆتزگ** (باک.): دووانە، جمک.

**جۆتک** (باک.): هەڵبەزین، جووت، گێرو جغزانی نەخشراو.

**جۆتکـار** (بـاک.): جووتـێر، جووتیـار. (بـاک.) ـــ ی: جووتـێری، جووتیاری.

**جۆتکـانی:** گەمەیەکـە لـە خـۆ فرێدانێـدا هـەردووک پێیـەکان بچـەقن.

**جۆتکین** (باک.): لە خۆشیان هەڵپەڕین.

**جۆتماقە** (خۆ.): (خۆ) خێرمانە، شەنگلە بەرەکەتە، کە دوو مازوو یا بادام یا هەر بەرەدارێکیتر کە پێکەوە نووسابن.

**جۆتۆ** (باک.): (باک.) گۆتۆ، جەنگاوەر(ناوێکی کۆنی کوردانە).

**جوت** (فە، باک.): گەمەیەکە.

**جۆتیار** (باک.): جووتێر، جووتیار.

**جۆخۆر:** جۆخۆرە، جوورە باڵندەیێکە وەک چۆلەکە وایە.

**جۆخـۆرە:** زەردی وەلی، زەردی جۆخـۆرە، جـوورە باڵندەیێکـە، وەک چۆلەکەوایە، جۆخۆر.

**جۆخۆرکە:** باڵندەیێکی کەژو چکۆڵەیە بەقەد پەڕەسێرکەیەکییەو کلکی درێژە، (بابا.) بەفرخۆرە، (هەورا.) وەروەورێ.

**جۆخین:** خەرمان، جێگای خەرمان، جۆخینان.

**جۆخینان:** مانگی بـەرایی هاوینییـە، (بـاک.) حزیـران، کاتی خەرمانی دەخڵی.

جۆخین

**جۆخینە:** خەرمانەی دەوری مانگ و ڕۆژی.

**جۆداس:** قـەلاس، قومام، گیایـەکی کێـوی زبرە وەک جـۆ وایـە بـەڵام شیرەی کەمـەو گوڵـەکەی دان نـاگرێ، برژانگی گوڵـەکانی لـە چاوی ئاژاڵ یـا وولاخ بدات برینداری دەکات مارەیەکی ئاوی پێدا دێتـە خووار.

**جۆدان:** کاکیلەی وولاخی بەرزەو ڕەشەوولاخانە، جوورە گرێجییەکە لە ددانی وولاخی یەکسم دا جۆی پێدەهاڕێ. کوخڵ: کەسێکە سەرپەرشتی مـەرەزەی بکـات. جۆدانـە، بـە دانکـەوتنی وولاخـە بـەهۆی دانێکـەوە زەدە بووبێ و دانی پێ نەخورێت.

**جۆدانە** (ئەردە.): جۆدان، ئەنباری جۆیە.

**جۆدرەو:** کاتی دروێنەهاتنی جۆیە. مانگی حوزەیرانییە.

**جۆر:** چەشن، شێوە، لف، وەک، یاسا. (باک.) گیایەکە.

**جۆڕ:** جوورە پەنیرێکی باریکە.

**جۆراو:** گۆرەوی. کلاشێک بنەکەی لە چەرم بێت. *

**جۆراوجۆر:** جووراوجوور.

**جۆرەجۆر:** قۆرەقۆر.

**جۆرەیی** (ڕەوا.): جوورە نێرگزێکی شەست پەڕییە، دارێکە بەرەکـەی خڕو سوورو وورده هەرکەسێکی حەوت دەنکی لێبخوات تا حەوت ساڵان چاوی نایەشێ، شوولکیشی لە ملی وولاخی پسکدار بکرێ چاکی دەکاتەوە.

**جۆڕک** (رەوا.): توورەکەی وولاٚخان، کیسەی گەورە، جۆڕکە.

**جۆڕکە:** جۆڕک.

**جۆری:** گوڵێکی بۆنخۆشی جوانە، وەک قەسپەڕ بەڵاٚن بچووکتر و ڕەنگی تێرترە.

**جۆزان** (باک.): گوێزان.

**جۆزەرد:** جۆزەردان، کاتی دروێنەی جۆیە، کاتی پێگەیشتنێیە.

**جۆزەردان:** مانگی جۆخینـان، مانگی خەرمانان، بارانبڕان، (باک.) جەهزەرا، مانگی سێیەمی بەهارێیە.

**جۆش:** کوڵاٚنی شلەمەنی و ئیتر، خرۆش، گەرم بوونی کەڵلەی کەسێکی، بە ـــ: جۆشدار، بێ ـــ: بێ خرۆش. جوورە خشتێکی قورسی شینکارە، کە زۆر سوور بووبێتـەوە. چەسـپ، ئەودووانە ـــ دراوون واتا پێکەوە نووساوون.

جۆزان

**جۆشـان:** کـولاٚن، خورۆشـان. ـــ دن: کولاٚنــدن، خورۆشاندن.

**جۆشخوواردن:** توانەوەی بەسەر یەکتریدا چوونی هەندێک چت بەهۆی ئاگرەوە.

**جۆشدار:** بەجۆش. ـــ ی: بەجۆشی.

**جۆشدان:** کولاٚندن: هینانەکوڵ لەسەر ئاوور.

**جۆشڕەبە:** ئەو جۆیەیە، کە لەکاتی گوڵکردنێدا ئاوی تێرابێ بـەڵاٚن هێشتا دەنکی ڕەق نەبووبێ، فەریکە جۆ.

**جۆش سەندن:** کوڵینی شلەمەنی لە سـەر ئاوور. گەرم بوونی یـەکێک لـە کارێکیدا، مەبەس لە تاو سەندنی جیهانە لە هاوینێدا.

**جۆشن:** کەسێکە بە جۆشبێ و خۆی لەم ولەو هەڵبسووێ.

**جۆشیان:** هاتنەجۆش.

**جۆشیر:** جۆشیرە.

**جۆشیرە:** جۆیەکی شینە، کە تازە شیرەی تێپەڕیبێ.

**جۆشیلە:** جۆشیرە.

**جۆڤان** (باک.): جۆگەوان.

**جوڤۆنی** (هەورا.): جووانی، گەنجی.

**جۆق** (ژا.، هەورا.): ڕێز، پۆل.

**جۆک** (باک.): جۆگەلەی گچکەیە.

**جۆکێویلە** (باک.): جەهداسی، جەهداسک.

**جۆگا:** جۆ، جۆگە.

**جۆگـە:** جۆگا، جۆ، جۆی، (باک.) جان، جـەمۆک، (هـەورا.) جـووە، هێڵێکـی گـەورە یـا گچکـەی قووڵـە، کـە ئـاوی پێـدا دەڕوات بـۆ سـەر کشتوکاڵ.

**جۆگەلە:** جۆگەی گچکە، ـــ ی خڕ: جـلال، ـــ ی فرمێسـک: مخمخـک، مختی.

**جۆگەوان:** (باک.) جۆڤان.

**جۆڵ:** گیایەکی بەهارییە لە مێرگاندا دەڕووێ ئاژاڵ حەزی لێدەکات.

**جۆڵ** (باک.): زنجیر، ـــ کرن: زنجیرکردن. (باک.) تێکەڵاٚو، تەڤلی هەڤ، تێکەڵ، (باد.) چەند سەرە مەڕێک یا بزنێکە، جوورە گەغێکە.

**جۆڵاٚ:** کەسێکە، کـە بەدەست چتی بتەنێ لـە پێچاڵاٚندا، (لـو.) جولی، کۆرسکەر، واتە کەسێکە پیشەی جۆڵاٚیی بێ.

**جۆڵانـە:** چتێکـە لـە دارو تەختـە یـا لـە گوریس و پـەڕۆ دروستـەکرێ و منداڵـی تێـدا ڕادەژێـنرێ، جۆلانـێ، هـەرەزانی، هێڤـرۆک، هـەلوورک، بێشـکە، دیلانـە، جۆلـە، دیلانـێ، لـەلووە، لـەلووک، دنگلافسـتان، (باک.) دنگلهەڤا، هێلان، هێلەکان، جۆلە.

**جۆڵانەکەر** (هەو.): حوشتری خودا، بالۆکە.

**جۆڵانەکردن:** بە جۆڵانە گەمەکردن، هاتوچۆکردن.

**جۆڵانەی منداڵان بۆ ڕاژاندن ونووانندنی:** ڕابینۆک، لەلووە.

**جۆڵانۆکە:** جۆڵانەی چکۆڵە، چینجۆلەک.

**جۆڵانێ:** جۆڵانە.

**جۆڵاٚیی:** پیشەی تەنینی کەل و پەل، لەلایەن جۆڵاٚوە، تەونگەری، (گەر.، بار.) خانووت، کەرستەی جۆڵاٚیی.

**جۆڵاییکەرە:** جالجا ڵووکە.

**جۆڵە:** جۆڵانە.

**جۆلـە مێرگ:** شـارێکی کوردانـە موخـابین مـارەییەکـە لـە ژێـر دەسـتی ترکاندایە پایتەختی وولاٚتی هەکاری بووە.

**جۆلک:** مێگەلێکە لە ٥ تا ١٠ مەڕ و بزنان.

**جۆڵک** (ئەردە.): جووجەڵە.

**جۆم** (باک.): قوم، ڕق، ـــ بوون: قومبوون، ڕۆچوون. ـــ کرن: قومکردن، ڕۆچواندن. (باد.، خۆ.) جێگایەکە لە ناو شاخ و داخاندا ئـاو دربیێـتی، جێگایـەکی نزمـە جارو بـار ئـاوی تێـدا ڕادەوەستێ. (هەر.) بەندەکـە لـە جۆگەی گەورەترە لە چۆمی گچکەترە.

**جۆمـاڵ:** پاکردنـەوەی جۆگـەی گـەورە و گچکـەو قوڵـکردنـی، سـەڵەب. ـــ کردن: ڕادان، سەڵەبکردن، خاوێنکردنەوەی ناو جۆگەو ئیتر.

**جۆمـەرد:** جووامـێر، سـەخی، جوانمـێر، دڵفـراوان. ـــ ی: جووامـێری، (سەخاوەت).

**جۆمیلکە** (خۆ.): جێگایەکی نزمە جارجارە ئاویشی تێدا ڕادەوەستێ.

**جۆن:** جووین، جنێو.

**جۆنەگا** (زا.): جووانەگا.

**جۆنگ** (باک.): چۆک، ئەژنۆ. لە جێ چوونی پاشووی گوێدرێژە.

**جۆنی** (باک.): هاوونگ و دەسکەکەی. (زا.) دۆڵی دار یا بەرد، کە گەنم و برنـج و چتیـتری تێـدا دەکوتـرێ، (ڕەوا.) جـوون، (هـەورا.) دۆڵ، دەسکۆدۆڵ، سندۆڵ.

**جۆو** (باک.): کێوی.

**جۆی** (هەورا.): جۆگە.

**جۆیەبار** (ڕۆژ.): خاکێکە ئاوەزێ بێ و پڕبێ لە کانی و کانیاو.

**جۆی کێوی:** کارۆش.

**جۆی سپی:** کوردێستانییە، کە لە گەرمێنی بچێنرێ بەیەک دوو ساڵاٚن ڕەش دەبـێ، جـۆی ڕەشـیش کەگەرمێنییەکـە لـە کوردێسـتانێ بچێـنرێ بەیەکدووساڵاٚن سپی دەبی، خـاک و هـەوا دەیـانگۆڕێ هـەر جـۆ وانیـە چەڵتوکیش هەربەو جوورەیە برنجی کوردێستانی سوورەکەی کەمە یانییـەتی

بەڵان هی گەرمێن بە زۆری سوورە، چەڵتووکی گەرمێن لە کوێستانی بچێنرێ سووری نامینێ یا کەمتر دەبێ، هی کوێستانیش لە گەرمێن بچێنرێ سووری لێ پەیدا دەبێ.

**جوجمین** (زا.): تزیین.

**جوچکە**: کلێنچکەی گیان لەبەران، قلێنچکەکلکی ئاژاڵ و ماڵات. جووجەڵە، جووجیلە.

**جوچکەبڕیاگ**: (ئەردە.) دووابڕاو، ووتەیەکە لە پێهەڵکالانێدا بەکاردەبرێ.

**جوچکەلەقێ**: (ئەردە.) کلکە لەقێ، کلکە سووتە.

**جوچکەلە ناو گەڵگرتن** (ئەردە.): مەبەس لە هەڵاتن و شکانێ و خۆشاردنەوەیە.

**جودا**: جیاواز، جیا، جگە، جووایەز، تامەتام، جووێ، کل، جهێ، لاوە.

**جودابوونەوە**: لێکبوونەوە، جیابوونەوە، لێکدوور کەوتنەوە.

**جوداجودا**: جیاجیا، جووایەز جووایەز، جوێ جوێ.

**جوداکردنەوە**: (باک.) پارستن، وەشان، جگەو جیاکردنەوە، هەڵاواردن، سنکرن، چەرتکردن.

**جوداگانە**: بەتەنێ، بەتەنهایی.

**جودایی**: جیاوازی، جوویّیی، جیایی، بە ـــ: جوداگانە، بەتەنهایی.

**جوڕ** (باک.): چوڕڕە.

**جوورڕە**: باڵندەیێکی بۆرە لە چۆلەکە گچکەترە، بازی نێر، بە نێرینەی باڵندە و جانەوەران دەڵێن، جوورە دەنگێکە وەکوو جیرەی دەرگا وایە، دەنگی باریک.

**جووڕەئەسپ**: ئەسپی چوواردانگ.

**جووڕەباز**: بازی نێر.

**جووڕە پۆپنە**: چووڕە پۆپنە، جووڕە پۆتە.

**جووڕەپۆتە**: چووڕە پۆپنە باڵندەیێکی گچکەیە، بە مرۆی نابووتیش دەبێژرێ، جووقەقلی.

**جووڕەپیاگ**: مەردومی چوواردانگ.

**جووڕەکڵاونە** (ئەردە.): جووڕە قشە کڵاونە، شەوان هەڵخەڵەتێنە، چووڕەی تاجدار.

**جووڕەکەو**: کەوی نێر.

**جوردی** (باک.): مشکێکی گەورەیە.

**جوردە** (لو.): بەرگ و کاڵا.

**جوڕک** (باک.): جوورە ئاژاڵێکی گچکەو پەرپووت و نابووت و کەم نرخە.

**جوڕکە**: توورەکە.

**جوڕنە**: (بابا.) تیان، حەوزێکە لە گەرماوێدا ئاوی گەرمی تێدایە بۆ تێکەوتن و خۆ تێدا شوشتن.

**جوڕی**: جوورە ماسییەکە.

**جوڕیان** (ئەردە.): گۆڕان.

**جوستە**: ڕیزە درووەمانێکی تەنیشت باریکە. جستە.

**جوستوجۆ**: هەوڵ و تەقەلا. ـــ کردن: تەقەلادان بۆ دۆزینەوە یا بۆ زانین.

**جوسوجۆ**: جوستوجۆ.

**جوغە** (خۆ.): بەرمزا، گیایەکە.

**جوقنە**: باڵندەی زۆر گچکە و پەرپووت و لاوازە.

**جوگمە**: جومگە.

**جولحا** (لو.): جۆڵا.

**جومان**: جمان، بزووتنی مەمک و شیری ناو مەمک.

**جومبوش**: هاتوچۆو جووڵە جووڵ.

**جومجومە**: کەللەی سەر.

**جومژگە**: جومگە.

**جومشگە**: جومگە.

**جومگ** (باک.): جێگای دەزگای جۆلایی، کەرەستەی جۆلایی.

**جومگە**: جەمسەری دوو ئێسکان لە ئەندام، (هە.) گە، جمگە، جمژگە، جومشگە، زەنگە، زەند، خرتک، خەتە. (فە.) مستێک لە دانەوێڵە، مستی قووچاو بۆ لێدان و ئیتر.

جومجومە

**جومگی** (هەورا.): جووتە، دووانە.

**جومگی ماسای** (هەورا.): جومگە ئاووسان.

**جوملانە** (دەر.): دووانە.

**جون** (باد.): جوور، چەشن، (باد.) ڕەنگێکی ئاوێتەیە بە سپی و بە ڕەشی بنووێنێ، بۆز، ماش و برنجی.

**جونلخ** (هەورا.): چۆلەمێشکێنە.

**جوندی**: گوندی، ئازا، دلێر، پاڵەوان، تووندوتۆڵ، بەهێز، لەسەردەمی سوڵتان سەلاحەددینی کوردی ئەیووبیدا وشەی گوندی بۆ سوپای، (سەرباز) و عەسکەر بەکاردەبرا پیتی (گ) لەزاراوەی میسرییاندا بە (ج) دەنووسرێ بۆیە بۆتە (جوندی).

**جونگ**: ڕق، قین، ـــ گرتن، جونگ کردن، قینگرتن، لە جێ چوونی ئێسقانی پاشووی گوێدرێژە. چووز(بز) کەبەیەکێکەوە دەکرێ. ـــ پێوەکردن: چووز پێوەکردن.

**جونگە**: جومگە. (ئەردە.) توورە، قەڵس. دەنگی تری باریک و بچوک.

جوندی

**جونگەجونگ**: تری باریکی یەک بە دووای یەکتریدا، ویزەویز.

**جونگ پێوەکردن**: چووز پێوەکردن.

**جونێ** (باک.): نێوی ئافرەتانە.

**جوهن** (باک.): هاوەن.

**جوهوور** (باک.): (باک.) جهار، توورەکەی ئالیکی وولاخانە.

**جوهی** (باک.): جوولەکە، جوو.

**جوهیم**: (باک.) وولاخی بەرزەی تووڕەو بزۆزە، شەمۆز، چەمووش.

**جوین** (ئەردە.): جوولان، جوولیان، جووڵیانەوە، زیویان، داجورین.

**جوو**: جوولەکە، جهوو، جوهی، مووسایی. (فە.، لو.) جۆگە.

**جووار** (زا.): توورەکەی وولاخانە.

**جووال** (باک.): جهال، جحێڵ، جووان.

**جووالْ:** (ئەردە.): جەوالْ، گەنم و جۆ و دانەوێڵەی تێدەکرێ، تێڕ.

**جووالْدووز:** جەوالْدروو، سووژن.

**جووالْ مووتاوی:** جەوالْ، جانی خانی.

**جووالْۆک** (باک.): توورەکە، تۆربە، کیسە.

**جووامێر:** شۆخ، ئازا، بەجەرگ، جامێر، جۆمەر، لاوچاک، خورت، تونـدو تۆلْ، لە بنچینەدا (جوانمێرد)ە. دڵفراوان، ڕەند، پیاوچاک، جوانمەرد، جوامەرد، مەردەمێر.

**جووامێری:** شۆخی، ئازایی، بەجەرگی.

**جووان:** شۆخ، سپەهی، دەق، پەریزادە، پەریڕوو، پەریڕوخسار، گـەوور، دەلال، خشت، قشتیلە، نەشمیل، تەوار، پت، پتکۆ، پتۆ، چەلەبی، خن، نەخشین، ڕەند، فۆدل، زەری، قۆز، جوندی، خۆـ کردن: بەدەوری خـۆ هەلاْتن. مرۆ یا چتی ڕێک و دلْگر و خشتە، (باک.) جان، جوانچاک، (هەورا.) جۆقۆن، شەنگ، چەلـەنگ، قـازاخ، قشـت، کـۆک، یەڤـەن، (بابا.) قازە، ڕنە، (باک.) سەرپەر، لال. جحێڵ، (هەورا.) گەنج، لاو.

**جووانـاو:** ئارەقەیێکی سارده نەخۆش لەکاتی گیانەلاْیەدا دەریدەکا.

**جووانـە زەوە:** جوانەزووە.

**جووانـەزووە:** عازەبە، عازەبی زیپکەیەکە لە گەرمان پەیدا دەبێ.

**جووانـەزۆ** (هەورا.): جوانکە، زیپکەی عازەبییە.

**جووانـەگا:** پانێرێکـە پێـی نابێتەسـالْی سـێیەم، (بـاک.) جوانگـەە، جوانەگا، سانگۆ، سنگوولە.

**جووانـەماین:** جوانووە ماینێکی مێیە، کە ٥ بەهاری دیتبێ.

**جووانـەمـەرگ:** کەسێکە بەگـەنجی بمری. (بـاد.) گولێکـە لـە نێـو گۆڕستانێدا شـین دەبـێ بـەیانیان دەبووژێتـەوە و بـە ڕۆژ دەپووچێتـەوە، (زنبق).

**جووانـەهەسپ:** جوانووێکی نێرە، کە ٥ بەهاری دیتبێ.

**جووانبەخت:** بەختەوەر.

**جووانچاک:** جووان، لاوچاک. ـــ ی: جوانی، لاوچاکی.

**جووانڕۆ:** مەحالێکی سەربەخۆیە لە نیوەڕۆی هەورامانی کوردستانێدایە بەندیواری بە ئەردەلانیانەوەهەیە.

**جووانکە** (خۆ، بابا.): زیپکەی خۆناسینییە، جوانـەزۆ، جوانـەزووە، زووە، جۆش، زیپکەی عازەبییە، زیپکەی جحێڵییە.

**جووانکە** (هەو.): جوانی خۆشەویست، جحێڵ (بۆ کوڕ و کچ).

**جووانکەر:** ڕازێنەر، چەت.

**جووانکەلە:** جوانی خنجیلەو بچووک، جوانکە.

**جووانکران:** خەملێندران.

**جووانکردن:** خەملاندن، ڕازاندنەوە.

**جووانکیلانە:** جوانکەلە.

**جووانکیلە:** جوانکیلانە، نەشمیلە.

**جووانـگـا** (باک.): جوانەگا.

**جووانمەرد** (ئەردە.): جوامێر. ـــ ی: جوامێری.

**جووانمێر:** جوانمەرد، جوومێر، مـەرد، دڵفراوان. کابرا، هەرامـە، هـێن، وانێک، گۆڕین، جحێڵ، لاو. ـــ ی: جحێلی، مەردی.

**جووانـــن** (ئـەردە.): جوولاْنـدن، لەراندنـەوە، لـەقاندن، جوولاْنـدن و لەراندنەوەی گوواره و ئیتر، جوولاْندن، تەکان پێدان.

**جووانوو:** (هەر.) جانی، کوڕکوڕە، بێچووی ماین، (فە. زەن.) نۆبا (هـی مـێ)، (هـەر. هـەورا. بـاد.) جووانـی، (فـە.) مـۆرە، کـورک، کـوڕک چاروا، ـــ ی مێ: مالجەهنو، مەهین.

**جووانولکە:** جوانوی ساوا.

**جووانووەماین:** جوانووی مێ.

**جووانووێری** (موک.): کردار، ڕەفتار، خوو.

**جووانی:** تافی گەنجی، شـەپالْی، لاوی، دەلالی، سپەهیتی، چەلـەنگی، جوولەکانی، زمانی جوولەکان.

**جووانێ:** جووان بوونی چت، ناوی ئافرەتانە، جوانوو.

**جووانێتی:** سپەهیتی.

**جوواو:** جواب، وەلاْم، وەرام.

**جوواودان:** وەلاْم دانەوە، وەرام دانەوە.

**جوواهێر:** گەوهەر، نێوی ئافرەتانە.

**جووایەز:** جیاواز. ـــ ی: جیاوازی.

**جووە** (هەورا.): جووتە، دووانە.

**جووبار** (ئەردە.): شووێنێکە داروباری زۆربێ، (ئەردە.) جۆم.

**جووبڕک** (زا.): ملە.

**جووت:** برێتییە لـە دوو گا جووت یا دوو ئێستر یا دوو گوێدرێژ یا دوو کـەلْ، کە لە ژێر یەک نیڵەدا بن و بەسرابن بەیەکەوە بۆ جووت کردن و بۆ کشتوکالْ و زەوی کێلان، (دەر.) جفت. دووتـاک، دوولـنگ، چتێکـە تـاک نـەبێ، وەکوو جووتەگایەک، جووتـە ئەسپێک، جووتـە کـەوش، جووتـە گۆرەوی، ئاشت، ئارام، تەبا، بێدەنگ، ڕێک، بەرانبەر، تەراز، وەرانوەر، هاونێڵـە، هاولف.

**جووتانە:** چتێکە لـە خاوەند جووت بستێنرێ سالْی جارێکی.

**جووتە:** بۆ منداڵی شووم و نەگبەت بـەکاردەبرێ. لـەقـەی وولاْخی یەکسـمە بـە هـەردووک پاشـووان، جووتلەقـە، لووشکە، جفتــە، (کـە.) جووتکـە، وولاْخێکە، کە دوو شارەگ لە نێو چاوانیدا بەرز بووبێتەوە، کە ئەمـەش لـە نیشـانەی چـارە ڕەشـێتی خـاوەندی دەزانـن. جـوورە پـارەیێکی زیوێـنی ئێرانییە، کە بایی دوو قڕانانە، دووقڕانی. دووبەدوو، پێکەوە. دووانە، جمک، دووگیاندارن، کە بە زگێکی بووبن.

**جووتەقانی** (ڕەوا.، هـەورا.): قژ، پرچ و قژی بـلاْوو ئـالۆز و بـەڕەلاْوەکوو هی دێوانەو دەروێشان.

**جووتەنی** (باک.): بەراوورد، بەراوەرد.

**جووتەوەشاندن:** لەقەوەشاندنی یەکسمبە هەردووک پاشووەکانی.

**جووتــە وەشێن:** برێتییەلــە ئـادەمیزادی قسـەتڕن. وولاْخێکـە جووتـە بووەشێنێ.

**جووتـەی سـەران:** بـۆ دووکەسـان بـەکاردەبرێ، کـە هەمیشـە لـەیـەک جێگـا پێکەوە ئامادەبن.

**چەمۆڵەگرتن**: چەمۆڵەلێنان.

**چەمۆڵـەلێنان**: ڕاسـتکردنەوەی دەسـت بـە بـڵاو کردنـەوەی پەنجـەکانی بەرانبەر بەڕووی یەکێکی بۆ تەریق کردنەوەی.

**چەمۆڵەدان**: چەمۆڵە لە کەسێکی نان.

**چەمیاگ**: چەماوەوە، چەوتاوە، خەم، چەم، گێڕ، نووچیاگ، قاغ.

**چەمیان**: چەمان، خوواربوونەوە.

**چەمیانەوە**: چەمانەوە، چەمینەوە، نووچیانەوە، گیرپان، کۆمەوبوون.

**چەمیاندنەوە**: چەماندنەوە.

**چەمیاو**: چەماوەوە، کۆم.

**چەمیاوە**: کۆم.

**چەمیحانی** (باک.): شووێنێکە دارە تووی زۆر لێبێ.

**چەمیش** (لو.): کەوش.

**چەمیلە** (بابا.): جوورە ترێیەکە. (کە.) بەروولە تریزوو، تریزووی ناسک و چەماو، کەلە بەراوداکرابێ. (کۆ.) دارو گیاو شیناییێکە لە کەنار ئاوان شین بێ.

**چەمین**: چەمینەوە.

**چەمێنەر**: داهێنەر.

**چەمینەوە**: چەمانەوە، نوشتانەوەی چت بە کەوانەیی.

**چەمیو**: چەماوەوە.

**چەن** (ڕۆژ.، فـە.، ئـەردە.): چـەند، ئـان، (بـاک.) چەنەگـە. (هـەورا.) دەرزی.

**چەنارخ** (ئەردە.): چەنەگ. (ڕەوا.) ژێرچەنە، بەندی ژێر چەنەگەی ژنان.

**چەناکە**: چەنەگە.

**چەناگە** (هەورا.): چەنەگە.

**چەناگەدان**: برێتییە لە زۆر قسەکردن و چەنەلێدان.

**چەناگەدرێژ**: چەنەباز.

[illegible]: چەنەگە شکاو، چەنەوەر.★

[illegible]ن: چەناگە کوتێ.

**چەنان** (ئەردە.): چەندان، ئاونە، هێندەی.

**چەنانی پێشوو** (ڕۆژ.): لەچاخانی ڕابردوودا، چەلان، جاران.

**چەنایێ** (هەورا.): لاسایی.

**چەنە** (فە.، موک.): چەنەگە. ـــ لێدان: چەنەگەلێکدان، قەوچەقەوچ، چەنەبازیکردن. زەوییەکە قوڕێکی هێندە بە تینی هەبێ لاقی وولاخان بگری. (لو.) هێندە؛ ـــ ی قرانێک: هێندەی قرانێک. (خۆ.، موک.) هەرەس.

**چەنەباز**: فرەواچ. (هەورا.) فرەدوو، چەنـەدرێژ، زمـاندرێژ، لاترقـەوچ، لۆترەوان، دەمەتەقێن، قەرەچەناغ، چەنەسووک، چەوچەو، چەنەهەراش، زۆردوو، بەسبێژ، بەژۆک، زۆربڵێ، چاوەش، بلبلە، پلپلێ، چیرەدرێژ. ـــ ی: دەمەتەقێ، هەڵپەهەڵپ، چەنەسووک، چیرەدرێژی، چەنەهەراشی، چخچخی، پلپلیی. ـــ کردن: چەنەلێدان.

**چەنەبەچەنە**: چەڵتەچەڵت، دەمەتەقێ.

**چەنەبەچەنەوێستان**: بەرانبەریکردنی یەکێک بۆ یـەکێکی تر بـە قسـە لـە ڕووداکردنەوەی.

**چەنەچەن**: چەنەدان.

**چەنەدان**: چەنەبازی.

**چەنەدرێژ**: چەنەباز، زرچۆنە، سەهەندە، قەرەچەناغ. ـــ ی: چەنەبازی.

**چەنەسووک**: زۆربڵێ، چەنەباز، چیرەدرێژ، پلپلێ. (باک.) نەوالخ.

**چەنەسووکی**: زۆربڵێیی، چەنەبازی، چنچنی، (باک.) پلپلیی.

**چەنەکەردەیۆ**: (هەورا.) چەنەکەردییو، لێگرتنەوە.

**چەنەگـە**: (هـەورا.) چەناگـە، چەنـە، ئـەرزینگ، (فـە.) زنـج، زنـچ، ڕێدین، زەنی، (دەر.) زنخدان، (بـاک.) ئارچەن، ئارزەن، چـەن، (ڕۆژ.، جا.) چناگە، کاکێرک.

**چەنەلێدان**: زۆر بڵێیی، قەوچەقەوچ، چەنەبازی کردن.

**چەنەلێکدان**: زۆر بڵێیی، قەوچەقەوچ، چەنەدان.

**چەنەوەر** (فە.، شوا.): چەنەباز، دەمـەوەر، چناگەشکیاگ.

چەنەوەرە (هەورا.): چەوەندەر.

**چەنەوەردار** (هەورا.): تێوەردان.

**چەنەوەری** (فە.، شوا.): چەنەبازی، دەمـەوەری، چناگەدان.

**چەنەووردار** (هەورا.): چەنەباز.

**چەنەووردییەیۆو** (هەورا.): لێووردبوونەوە، تێبینی.

**چەنبـەر** (بـاد.): داوی نێچـیران، هـەرێمی کەوانەیـە، مـوو و تووکـی نێوچاوانە.

**چەنبەرە**: تۆقی دەورەی چتی، جێگایەکە لەکۆیە.

**چەنتە** (بـاک.): جـەنتک، جەنتـە، جانتـا، وەکـو توورـەین و خورجـی چتمەک و کەلوپەلی تێدەخەن.

**چەنتەلی** (باک.): جوورە چەکێکە.

**چەنتک** (باد.): تۆشەبەرە.

**چەنجاز**: چەند چەل، چەن بار.

**چەنچووز** (زا.): ڕژد، چرووک.

**چەنخووس** (باک.): ڕژد، بەرچاوتەنگ، چرووک.

**چەند**: (هەورا.) چەن؟، (باک.) چقاس؟، لـەوما، بۆ پرسیارلـە چەندێتی و ژمارەی چتان بەکار دەبرێت، بۆ پرسیارە.

**چەندان** (هـەورا.): دەرزیـدان. مـاوە، هەرچـەندێکی، کـاتێکی نزیـک، تائـەو ـــ ە: تائەونزیکانە. هەند، دوو یـا چەندهـەند، هێندە، کـەم، فـەرهاد پارەیێکی چەندانی پێ نیە واتا هێندەی پێ نییە.

**چەندانە**: هەند، دوویاچەندهەند، هێندە، دەم.

**چەندای وەنە** (هەورا.): دەرزی لێدان.

**چەندە**: چقاس، چەن، چەند، بارتەقا. پرسیار بۆ ژمارە یا هێندە یا پێوانـە یا قەبارە یا پارە و چتی تر.★

**چەندەم**: پرسیار لـە پلـەی کەسێک یاچتێک، یـا لـە ژمـارە هـاتنی بـە زنجیرە.★

**چەنئوچوون**: چاکوخۆش. ـــ ی: چاکوخۆشی.

**چەندی:** هێندەی.

**چەندێتی:** ئەندازەی چتی لە بابەت ژمارە یا زۆرو کەمییەوە.

**چەندین:** هێندە.

**چەنر** (فە.): چەنگاڵ.

**چەنسووتەکە:** چێشتێکە لە ترخێنەی ووشک و ساوار یا برنج دروست دەکرێ.

**چەنک** (باک.): باز. ـــ کردن: بازدان. (زا.) چەنگی مرۆڤان، باڵی باڵندان، (باک.، بۆ.، باد.) باڵ، زەنگ، نێوانی هەردووک دەستانە، پڕ بە ـــ: ققدک، چنگ، دەست.

**چەنکرن** (باک.): دەربازبوون، تێپەڕبوون.

**چەنگ** (باک.): باڵ، خۆهەڵدان، خۆناوێژتن. ـــ کردن: بازدان. (باد.، بۆتا.، باک.، زا.): باڵ، ققدک، پڕبە ـــ، نێوانی هەردووک دەسی ناوەڵەیە. (ئەردە.) گیر، چەم، خەم، چەمیاگ، چەماوەوە. (موک.) مرازێکی شایلۆغان (مۆسیقا) یە دوو پارچەی خڕوپانی زەردن لێکدەدرێن، زنج، مست: پڕبە ـــ ی: پڕبەدەستی. (باک.) باسک، باڵ، چنگ، چنگاڵ. خووە ـــ کرن: بازدان.

**چەنگاڵ:** سێتلک، قولاپی نانی، (باک.) چنگاڵ، قولاپی گچکە. بە هەموو گیان لەبەر و چتێکی وا دەڵێن، کە چنگیان هەبێ. چنگاڵ، چنگوڕک، چەنگوڕک، چنگر، پەنجەی دڕندە و باڵندەی گۆشت خۆر، نەپەرووشک ئاسنێکی نێوکونە و قەلانگێکی زۆری بە کەنارەوەیە چتی لە بیر و چالاوان پێدەردەهێننەوە.

**چەنگەپاچە:** دەستەپارچە. ـــ بوون: دەستەپارچەبوون.

**چەنگەپارچەیی:** دەستەپارچەیی، بێ دەسەڵات. (هەو.) دەست و پێ سپی، پێ زاخ.

**چەنگەپڕە:** چنگە پرچێ، چەنگە پرچە، شەڕێکە بە دەست وپەلان ئەنجام بدرێت.

**چەنگەپرچە:** شەڕێکە بە دەست و پەلان ئەنجام بدرێت.

**چەنگکۆل** (شەم.): سمکۆڵ.

**چەنگەک** (ئەردە.): قولاپ، چفتە، چفتەوڕاسە.

**چەنگر** (فە.): چەنگاڵ.

**چەنگ گرتن:** چەنگ لێدان.

**چەنگل** (فە.): چەندجار.

**چەنگلاندن** (باک.): هەردووک دەست و چەنگ وپەنجان تێکنان.

**چەنگوبار** (کۆ.): چەنگێک هێنان و بارێک بردن، چەند چاندن و بارێک هەڵگرتن.

**چەنگورک:** چنگوڕک، چەنگاڵ، چنگاڵ.

**چەنوو، چەنۆ** (هەورا.): لەگەڵ، لەتەک.

**چەنوەنەدای** (هەورا.): دەرزی لێدان.

**چەن و چوون:** چەن و چۆن، چەند و چوون، گێرەوکێشە.

**چەندوچووێن** (ڕۆژ.): چەن و چۆن.

**چەلێ** (ئەردە.): چەند، چەندی.

**چەنێ** (بار.): شمشەی برووسکێیە، ئاوارەی برووسکێیە.

**چەنی** (هەورا.): دەرزی، (فە.) دەرزەن. لەگەڵ، لەتەک، گەر، تەک، لەگر. (باڵە.) کەندالی ڕفۆک، بەوگلێ و خۆڵەش دەڵێن، کە لە کەندالی ڕفۆک دەڕوخێ (هەورا.) بۆچی؟، بەهۆی چی، : چۆنی؟، چەنی.

**چەننێ:** چەندڕۆژێ.

**چەنیدان** (هەورا.): دەرزی دان.

**چەنی گولانێ** (هەورا.): گولانی هی مێینە و گولانە هی نێرینەیە، دەرزیلە، دەرزی بچووک.

**چەنی ونەی** (هەورا.): دەرزی ودەروو.

**چەو** (دەر.، فە.): چاو. (کە.، هەورا.، جا.) خیز، زیخ، لیم.

**چەوا** (باک.): چلۆن، چۆن، (هەورا.) چەنێ.

**چەواشە** (ڕۆژ.، هەورا.، کە.): ئاوەژوو، شێواو، تێکچوو، پاشەوپێشکراو، واژی، ئاوەژوو، بێسەروبەر، سەرلێشێواو.

**چەواشۆ** (هەو.): ڕەنج، ئەرک، قووڵ، دوورو درێژ.

**چەوە** (لو.): چاو.

**چەوەڕ** (دزە.): پەڵخوڕ، پاشماوەی ئالیکی ماڵات وئاژاڵانە، کۆتەڵ، چەوەڵ.

**چەوەڵ:** چەوەر، پاشخۆری ووڵاخان.

**چەوەنەر:** چەوەندەر.

**چەوەندەر:** (هەورا.) چەوەنەر، سلک، بەتۆو دەچێنرێت لەلایەن گەلاوسەلکییەوە هەر وە تووری دەچێ، ـــ دوو جوورە، لە جوورێکیان شەکر دروستدەکرێ و هەردووک جوورەکانیان شیرینی بۆ ڕەوانی باشە.

**چەوەندەربەترش:** چێشتێکە لە چەوەندەرو برنج و ترشاوێ دروست دەکرێ.

**چەوباز:** قەلەندۆر.

**چەوت:** خووار، چەفت، لار، خێچ. ـــ بوون: چەمانەوە، خووارببوونەوە. ـــ کردن: چەماندنەوە. ناڕاست، هەڵە.

**چەوتان:** چەوتبوون، چەمانەوە.

**چەوتانەوە:** خووارببوونەوە.

**چەوتاندن:** خووارکردنەوە، چەماندنەوە.

**چەوتاوە:** چەماوەوە.

**چەوتە** (باد.): ڕێگای قەدپاڵ.

**چەوتەک:** شەقەمێو، بریتییە لە توولەی مێو ڕاکێشان بەزەویدا، کەناوەناوە خۆڵی بەسەردا بکرێت سەوزدەبێ ئەو لە نێوانەکانیاندا دەبڕ ـــ ڕێن ولە یەکتری جووێ دەکرێنەوە ئەوسا هەرپارچەیەی دەبێتە بنێک.

**چەوتەکەڵ:** چەفتەکەڵ، گاجووتی چوار ساڵەیە.

**چەوتەچێلەگر** (بابا.): سەرنجدان و پشکنین، چێلەوچەوتە، چەوتەوچەوێلە، چەوتەچێلە.

**چەوت و چێلەگرتنەوە:** ووردبوونەوە لە چت بەڕەنگێکی، کە جووانی و ناشیرینی ئەو چتە دەرکەوێ.

**چەوتی:** خوواری، گێڕی، کێمی، کێماهی.

**چەوچەو** (باک.): زۆربلێ، چەنەباز. (باک.) بگرەوبەردە، شێواوی، شلۆقی، شلەژاوی، چرتەچرت.

**چەودار**: چەودەر، چێوەدار، جامبازی ڕەشەوولاّخان.

**چەودان**: جۆداس، گیایەکە قەفقەف وەکوو جۆیە بەلاّم گوڵەکـەی زۆر زبـرە و دەنکی نیـە لـە نێو گەغیدا سەوزدەبیّ، قـەلاّس، قومـام، چۆدەر، چـاودەر، چەوڵـەک.

**چەودەر**: چەوڵـەک.

**چەودەن**: مـەفرەق، ئاسنی خاو.

**چەوور**: چەرب، قەڵـەو، تـێردۆن، ڕۆنـاوی، تەواشـە، دۆنـە. ــ بوون: ڕۆن تێـدران. ــ کـردن: چـەربکردن، ڕۆن تێهەڵسـوون. ــ کردنـی نـان: ڕۆن لەنانی هەڵسوون. (هەر.) گیایەکە وەکوو بەندۆکی لە نێو شیرێژی دەکریّ پەلکی وەهی بیزای دەچیّ. (بـاک.) هیـچ و پـووچ، نالـەبار، نـاڕێک، پڕووپووچ. (ئەردە.) بالاّ، بالاّتر، فرەتر، سەنگینتر.

**چەورایی**: بۆ، زۆم، چەوری.

**چەورە**: دەستەسڕ، مـەردومی بێشـەرمی بـەرەلاّو هـارو هـاج. گیابەرخۆڵـە، چەورۆکە.

**چەورەبی** (ڕەوا.): گیایـەکی کوێسـتانییە گەلاّیـەکانی وەهـی دارە بـی دەچیّ وەکوو ڕێنجە دەدریّ بە ئاژاڵ ومالاّتان.

**چەورەسان**: چەورێکە لـە نـاو ڕوندانێـک بکریّ وەکوو کەڵەشاخ و ئیـتر بـۆ تیژکردنی چەقۆوداس و تەوەرداس و تەورو هەموو چەشنە تیغێکی یا لـە سەرهەسان دانریّ.

**چەوەرستانی**: چەورسان.

**چەوەرە شیرینی**: زمانلووسی.

**چەورک** (خۆ.): گیابەرخۆڵە، چەورەبی.

**چەوورکە**: گیابەرخۆڵە، چەورەبی.

**چەوروچڵیک**: پیس و پەڵۆس، چڵکی و چەوور.

**چەورۆکە** (کۆ.): باڵندەیێکە وە پەرەسلێرکەی دەچی(تـەیرەن ئەبابیلـە). دەسرۆکەی گچکـە. گیایـەکی بەهارییـە گەلاّیـەکانی بـە سـەرزەویدا پـان دەبێتـەوە، نـێرکێکی دڕوواوی دەردەکـات بـەپاک کـراوی دەخـوریّ، گەلاّیـەکانی ووردن و گولێکـی دەگـریّ تۆوێکـی ووردی تێدایـە، وەکـوو ڕێنجە دەدریّ بەمالاّت و ئاژالاّن، (هەر.) چەورە، (خۆ.) چەورک.

**چەورونەرم**: زمانلووس.

**چـەوری**: ڕۆن، بـەزوپیو، بـۆ، چـەورایی، دووگ، زەهـۆم، دۆن، (شـن.، مـەنگو.) بۆ، گوزوو، پیوی ناوزگ.

**چەوریدان**: چەورەسانی دارتاش، ڕۆندان.

**چەوڕێژ**: خیزڕێژ، ڕێگا یا شووێنێکە چەوی زۆر تێدا ڕاخرابیّ.

**چەوری و نەرمە**: گۆشت ودووگ.

**چەووس**: ئازار، ڕەنج.

**چەوسان**: ئازارکێشان و ماندووبوون.

**چەوسـانەوە**: (مـوک.، کـۆ.، کـە.): ئازارکێشـان، چەوسـانەوە، ڕەتـان، بزووتن، جوولاّنن، ئارام نەگرتن، زۆر گەڕان، زۆر ماندووبوون.

**چەوساندن**: ڕەتاندن، ماندووکردن.

**چەوساندنەوە** (شا.): چرووساندنەوە، ئازارکردن، ماندووکردن.

**چەوک چەوک**: دەنگی گوجیلەسەگ و وولاّخانی ترە.

**چەوگان**: (ڕەوا.) گۆچان، (بـاک.) چۆکـان، (هـەورا.، ڕەوا.) قاشـۆ، (بابا.) دارشەق، (باک.) کوتکی دار.

**چەوگانێن**: گۆییێن.

**چەوڵەک** (کە.): چەودەر، جوورە گیایەکە لە نێو جۆیدا دەڕوویّ.

**چەولگ**: شووێنێکە چەوو لم و زیخی زۆر بیّ.

**چەولۆک**: سەرکۆزەری دانەوێڵەیە.

**چەولیک** (باک.): مێرگی گردی چۆمانە.

**چەوێر**: چەوێڵ، چووێڕ، گێڕ.

**چەوێڵ**: چووێڕ، چەوێڕ، گێڕ.

**چەه** (باک.): چا.

**چەهەڤ** (باک.، بۆتا.): چاو.

**چەهچەهە**: چریکەی بولبول.

**چەهرە**: بیچم، کەسم، تەرح.

**چەیرپیاڵە** (هەورا.): ژێرپیاڵە.

**چەیمانە** (کۆ.): ئاوکێشانی منداڵدانی ژنانە لە کاتی بیّ نووێژیـدا یا لـە پێش یان لە پاش مندال بوونێدا.

**چەیی** (باک.): چاکە.

**چەییگ** (باک.، ساڵە.، شارە.، جا.): چیاو، چیو، سارد (تەنها بۆ ئاو دەبیّ).

**چپ** (بـاک.): تنۆک، تکـە، ئاڤ چپچپ دکەڤـە ئـەرد: ئـاو تنۆک تنۆک دەکەوێتە سەر زەوی، دەنگی دلۆپەیە.

**چپان**: چرپان.

**چپـاندن**: چرپاندن، چپـەکردن. بـەگوێدا ــ: بەسرتە بـە گـوویّ هـەڵێنان، سرتەکردن، بەسرتە ئاخەفتن.

**چپانن**: چپاندن.

**چپە** (هەورا.): چرپە، سرتە، خشە. (باک.) ڕاست بوونەوە بەپەلە.

**چپـەچپ** (هـەورا.، ڕۆژ.): چرپـەچرپ، سرتەسرت، سرتەسـرتی یـەک لـە دووای یەکتری. تێکەوەدان، تێکهەلاّوێژتن، تنۆکە تنۆکە، دلۆپە دلۆپە.

**چپ بۆری** (باک.): تنۆکار، تکێـن، تنۆکـە ژمـێر، تنۆک ژمـار، قـەتارەی دەرمانی چاوان.

**چپچپ** (زا.): هەستی تکەی ئاو.

**چپک** (باک.): تنۆکەی چکۆڵە، پەڵە(لەککە).

**چپوهووڕ**: چپ و هۆڕ، چرپەچرپی زۆر.

**چت**: شت، چتمەک، شتمەک، کەل و پەل، (دەر.) چشت، (ڕۆژ.، بـاک.) تشـت، ئـانگ، (خـۆ.) ئەشـت، ئەشـتەبا، (بـاک.) تـەبا، تـەوا. ڕابـوون، (باک.) لـەسەرسەر ڕاوەستان لە گەمـەیەکیدا، ــ یک: شتێک.

**چتت** (بار.): چتە، (باڵە.) چتتە، پیخ، پیخە، بۆ لێخوڕینی بزنان بـەکار دەبریّ.

**چتارە** (باک.): ئەستێرە. (کە.) لـە پێشدا جوورە پارچە (قومـاش) ێکـی دێخدێخی سوورو سپی بووە.

**چناق**: شتاق، هیچ کامێکیان.

**چته** (چتته) (باک.): چتت، پیخ، پیخه، بۆ لێخوڕینی بزنان بە کاردەبرێ.

**چتگەل**: چتان، چتەکان.

**چتمەک**: پروپیت، پروپیتاڵ، شت، چت، شتومەک، کەل و پەل، چتومەک، (خۆ.) ئەشت، شتمەک، (باک.) پرتووک.

**چتۆ** (باک.): چلۆن، چۆن؟، (باک.) چتۆنە؟، بە هۆی چییەوە.

**چتوور** (ئەردە.): چتیر، چشتێر، چوویشتێر.

**چتۆڤ** (زا.): چۆن، چلۆن، کوو.

**چتوومەک**: کەلوپەل، تشت، کەلومەل، پروپیت، پروپیتاڵ.

**چتومت**: چشتومت.

**چتۆنە** (باک.): چلۆن؟، چۆن؟، (باک.) چتۆ؟.

**چتێ**: چتێک، چەنێ.

**چتیر** (بابا.، جا.، هەورا.): چوویشتیر، بزنێکە یا بەرانێکە، کە تەمەنی دوو ساڵانە بێ، بێچووی بزنە لە تەمەنی یەکەوە تا دووساڵان.

**چچ** (باک.): مەمک، چچک.

**چچرک** (باک.): غەرغەرەی چکۆڵە.

**چچک، مەمک** (باک.، باد.): بۆ ئافرەتی مێردکردوو بەکاردەبرێ چونکوو بۆ کچان هەر مەمک بەکاردەبرێ، چیچیلە.

**چخ** (رەوا.، شەق.): پەرە درێژەکانی باڵندانە، شاپەڕ. چغە، چغ، چخە، بۆ دەرکردنی سەگان بە کاردەبرێ.

**چخە**: چخ، چغە، بۆ دەرکردنی سەگان بەکاردەبرێ.

**چخەچخ**: چغەچغ.

**چخز**: چەغز (بازنە، ئەلقە)، شووێن، (باک.) چخیزەک. ـــ ت بزربێ: شووێن و چارەت بزربێ.

**چخمە**: برینێکی پیسە لە چاودێ، گیای شیوەران بە کوڵاوی، کە سارد بووبێتەوە لە چاو بکرێ زۆر باشە.

**چخیزەک** (باک.): چخز، جغز، جەغز، شووێن، جاڕ.

**چر** (باک.): جوورە گەمەیەکە.

**چڕ** (باک.): چۆڕ، ـــ ێک شیر: چۆڕێک شیر و نیتر. چەسپ، خۆڕاگر، قایم. (زا.، هەورا.، باک.، جا.) چێڕ، چیڕ، چڕ، چتی لنج و کەشکدار، گۆشتی نەبرژاو و نانی هەویری بەپێز چڕدەبن. کێوێکی کرانە و بەردەڵانی زۆر بێ. سپی وەکوو شیر. (باک.) دەنگی دڕاندنی تنراوە. چارە: چڕوچاوێکی شووم و ناشیرینی هەیە. (باک.) پرپەلک، پروتێکچرژاو، پەرچ، نوغوورد، شەخەڵ، چرستان، مێژەڵووک، دارستان، جەنگەڵ، بێشە، دارو درەختی زۆری تێکچرژاو. بێژ، کە بکەوێتە دووای گۆرانی نیتر: گۆرانی ـــ: گۆرانی بێژ، گۆرانی خوێن.

**چرا**: (سوور.، چی.): بۆچی؟، بۆ؟، بۆچ؟ بۆ پرسیارە، چرا ئازاد غەیبە: ئازاد بۆ چی تووڕەبووە. (هەورا.) چراوی، (باک.) لەمپە، لامپا، شەماڵە، مرازێکە لە کان یا لە شووشە نەفتی تێدەکرێ و پلیتەی تێدەخرێ، کە لێخرێنە (شخارتە) بەسەری پلیتەکەیەوە بنێن هەڵدەبی شۆقێکی وای لێپەیدا دەبێ شووێنی تاریکی پێ روووناک دەکرێتەوە.

**چرابزر**: جاران جوورە چرایەک بووە، کە بەرۆنی زەیتی دایبیساوە یانیش بە رۆنگەرچەکی.

**چرابوون**: فێرە لەوەڕبوونی ساوایان.

**چراتۆر** (جا.): لۆکس.

**چراخ** (ئە.): کشتوکاڵی باشی ئازاو. چرا. گیانداری بەدەماخ وقەڵەو.

**چراخان**: بەبۆنەی شادمانی و پیرۆزی و چتێکی ترەوە، کە لە ناو هەموو کۆڵان و پێش دووکان و بازارپدا زۆر چرا هەڵکرابێ ـــ ی پێدەڵێن، شەوگر.

**چراخیا**: هەستانە سەرپاشووانی ئەسپان.

**چراخ پێبوون** (کۆ.): لە پڕپا هەڵستان.

**چرادان**: پێچرا، قوتیلەی چرا، شووێنێکی تایبەتییە، کە چرای تێدا دانرێ.

**چراغ**: چرا. (باک.) قوتابییەکە پێی بخوێنێت و رەوشت و خوی فێربکەی.

**چراڤ** (باک.): زناو، باتلاخ.

**چراکەران** (ئەردە.): کاتێکە چرای تێدا دادەگیرسێ، ئێوارە، چراکردن.

**چراکردن**: چراهەڵکردن.

**چراکووژاندنەوە**: کوژاندنەوەی ئاگری چرا.

**چراکووژێنەوە**: کەسێک بووە کە کاری کوژاندنەوەی چرای پێسپێردراوە.

**چراگا**: لەوەڕگە.

**چرالخ** (باک.): دارێکە سەری دەکووتن و بە ئاگری هەڵیدەکەن، چۆڵەچرا، چلالخ لە چرالخ، ناوی گیایەکیشە هەر بۆ ئەو بابەتە بە کاردەبرێت.

**چراموش** (ئەردە.): دەستەچرا.

**چراندن**: بانگکردن. ـــ (باک.) دڕاندن.

**چراو** (هەورا.): چرا.

**چراوەچراو** (کۆ.): قاوەقاو، دەنگەدەنگ.

**چراووک**: جوورە چرایەکە: شوولکی مازوو یا هی بەروو لە قامک ئەستوورتر بە گەرمی بابدەن دووایە بەبنی تەشووێ دەکوترێ و سەرێکی هەڵدەکرێ وەکوو فانووس روووناکی دەدا و بۆ هەر شووێنێکی بچن لەگەڵ خۆیانی دەبەن، چۆڵەچرا، شەوچرا. (باڵە.) چراوکە.

**چراوکە** (باڵە.): چراووک، چۆڵەچرا. (هەورا.) گراڵک.

**چراموشی** (ئەردە.): دەستەچرا.

**چراوودەسی** (هەورا.): فانووس.

**چراولە**: چیلکەیەکی گچکە یا پووشکەیەکە، کە منداڵ سەرەکەی داگیرسێنێ و گەمەی پێ بکات.

**چراوی** (هەورا.): چرا.

**چرای** (هەورا.): بانگکردن.

**چرە** (شکا.): بۆچی؟، لۆچی؟، بۆ؟، لۆ؟، ـــ (باک.) بۆچی؟، لۆچی؟، بۆ؟، لۆ؟، چرا. جەنگەڵ ودارستان و لێرەوار. (هەورا.) بانگ بکە، گازکە. (جا.) چرە، کەڵەکە، تێکهەڵاوێژتنی مەردوم لەبەر زۆری. قاو، دەنگ، دەنگەدەنگ.

**چرەبەندان**: کۆبوونەوەی مەردومی زۆر لە شووێنێکا بە ناڕێکی.

**چرەخۆرە**: چەپوڕاس، دوومێرەکی.

**چرەدووکەڵ:** دووکەڵی زۆر و توندو پەیت.

**چرەوە** (کۆ.): چەقەچەق.

**چرپ** (ئەردە.): دزی.

**چرپاز:** چەپراست.

**چرپان:** سەرلێشێوان، سرتەکردن، چپان.

**چرپان چرپان:** تێک ئاوێژتن، پێککەوتن، سەرلێشێواوی، سرتەسرت، ئالۆزی.

**چرپاندن:** تێک ئاوێژتن، چرپان چرپان، چپاندن، چرپانن، بە توندی ڕۆیشتن، بلاوەلێکردن. (باک.) دادان، پەلکردن، (بۆ دار و پێنووس). چرپەکردن بە گوێی یەکێکیدا. (ئەردە.) دزین، فێڵکردن.

**چرپانن:** چرپاندن، دزین، فڕاندن.

**چرپایە:** چارپایە.

**چرپە:** خشە، هەست، خوست، ئاخۆتن بەسرتە، (هەو.) چپە، (هەورا.) چڤە، هەست و خوستی هەڵاتن، ڕۆیشتن، هەستی پێ.

**چرپەچرپ** (کۆ، بابا.): (باد.، هەو.) خشەخش، چپەچپ، سرتەسرت، هەستوخوست، (هەورا.) چڤەچڤ، خشپەخشپ، چرپەی یەک لە دووای یەکتری.

**چرپوچاپ** (ئەردە.): چاپ و گووپ. (ئەردە.) دزی.

**چرپ و چاڵ:** خشت و خاڵ، هەڕاڵ، پرووپووش، هەمژگ و هەمژاڵ، پژگاڵ، (ئەردە.) دزی، تالان. شوێنێکە پڕ دارودەوەن و قامیشەلان بێ.

**چرپ و هووڕ:** چرپ و هۆڕ، چرپەچرپی زۆر.

**چرپی:** لک و پۆپی هەموو جوورە دارێکی براوە بە تایبەتی هی دارەبی و چنار و نیتر، (دەر.) سەرچێنە، کەدەخرێتە سەرداری دارەڕایە. (باک.) قایەی مێوی.

**چرت:** چۆرتی حیسابی. (باک.) دەنگی لەوەڕینێیە. وەنەوزە، خەوەنووچکە. (باک.) هەڵبەز. ــ کردن: هەڵبەزین، هەڵبەزینەوە. (باک.) وورد. ــ کردن: ووردکردن. لەگەچوون، لە جێ چوونی خرتکە، جومگە.

**چرتاندن:** قرتاندنی تۆو و چتی تر.

**چرتە:** دەنگی شکانی شووشە و دار و ئیدیکەیە. سرتە، هەست، خوست، چرکە، دەنگی کەژمێرێیە، چکە، بەشێکە لە ٦٠ بەشەکانی خولەکی کاتژمێری، کە بە ئارەوی(ثانیە)ی پێدەڵێین.

**چرتەچرت:** سرتەسرت، چرکەچرک. چکەچکی کەژمێری، چرکەچرک.

**چرتەمیزە:** (ڕۆژ.) دەڵەمیزە، گمیزە، چۆرتکێ. چارە: گیای بۆنخۆشکە بکوڵێنرێ و بپاڵێورێ بۆ پشوو سووارى و میز ڕانەگرتنێ زۆر سوودبەخشە.

**چرتک** (باک.): هەڵبەزینەوە.

**چرتۆفرتۆ** (باک.): درۆزن، گێل، گەوج.

**چرتوون** (زا.): دۆزەقەی ئاشی.

**چرتێ** (باک.): ژنی زۆر گەرو ماڵانگەڕە.

**چرتین** (زا.): درانی کاڵا.

**چرچ:** چەکاڵ، چورچ، لەڕ، بێتووک، چورچەمەن، ئەوەیە، کە لۆچی تێکەوتبێ. ــ بوون: سیسبوون، لەڕبوون، لاوازبوون، لۆچ بوون، ژاکیان. چین، لۆچ، ژاکیاگ (هی ڕوو و نێوچاوان و جلک). ژاکاو، سیس بۆ چتی تازە و بەتایبەتی بۆ گوڵ و گژوگیا و ڕووەکانە. ــ کردن: ژاکاندن، چلمساندن.

**چرچە:** مرۆی چرچوسیس. هەست، جووڵە، خوست. ــ لە خۆبڕین: ماتبوون، هەست لە خۆبڕین. جوورە ترێیەکی تێکوڵ ئەستوورو درێژکۆڵەیە ڕەنگی وەهی قۆرەی دەچێ. (هەو.) نێرەمووک، مرۆیەکە نەنێربێ و نەمێ.

**چرچۆ:** ووتە و قسەی پووچ و بێ واتا.

**چرچرە:** باڵندەیێکی زۆر گچکەیە وەکوو چۆلەکەی وایە بەلان کەمێک ڕەشترە.

**چرچرە** (باک.): کەسێکە زۆری پێوە بنێ، بە فیشاڵ.

**چرچرک** (باک.): سیسرکە.

**چرچرۆک** (باک.): چیرۆک، ئەفسانە.

**چرچ قولی** (ئەردە.): پاڵکەوت، درێژبوو.

**چرچک** (باک.): کرێن، چەقێن، زەوی ڕەق. (باک.) باڵندەیێکە.

**چرچ و لۆچ:** چرچایی، چین. ــی ڕوو: چینی ڕوو. ــ دار: چیندار.

**چرچ هەڵاتن:** چرچ و سیسبوون، ژاکان، گەچران.

**چرچ هەڵهاتن:** چرچ و سیسبوون، ژاکان، گەچران.

**چرچی:** لۆچی ڕوو، چینداری، (باد.) پرمقی.

**چرچیان:** چرچ هەڵاتن.

**چرژ:** پەخش، بلاو.

**چەرژان:** شکانی دارێکییە، کە تلیشی لێپەیدا بووبێ یا پارچە و لکەکانی لێک جووێ نەبووبنەوە.

**چرژان:** پژان (بۆ مەرەکەب) بەکاردەبرێ، کە بلاو بێتەوە، (هەورا.) تەنینەوە، تێ، تێک. باخ و باخچە و جەنگەڵ و لێرەوار، کە پڕ بن و ڕوو تێککەن و تێک بئاڵێن ــی پێدەڵێن و بۆ هەموو چتێکی تێکەڵ و پێکەڵ و تێکچرژابن بەکاردەبرێ.

**چرژاندن:** بلاوکردن، پەخشاندن، پژاندن.

**چرژاو:** پروتێک ئالاو، پرژاو، پژاو.

**چرسان** (باک.): تروسکان. تروسکاندن.

**چرساندن:** تروسکان، چرسان.*

**چرستان:** چڕ، شەخەڵ، جێگایەکە پڕ دار و گیا و درکبێ.

**چرسک** (باک.): چروسکەی ڕووناکی.

**چرسکانەوە** (ڕۆژ.): تروسکانەوە.

**چرسین:** چاولە ڕەشکەوپێشکەدابوون، ڕەشکەوپێشکەی چاو. (باک.) تروسکان.

چرغ (ڕۆژ.): چرگ، خەرەک، دەزووی پێدەڕیسرێ.

**چەقر** (باک.): بلاو. ــ کردن: بلاوکردن، پێوەرکردن. ــ بوون: بلاوبوونەوە، پێوەربوون.

**چرڤراندن** (باک.): بلاوو پەرێشانکردن.

**چرڤری** (باک.): بلاوی، پەرێشانی.

**چرق**: قرچەی شکانی دار وچتی تره.

**چرقە**: سەختی گەرما، قرچەی گەرما. قرچەی ددان، ـــ ی شکانی داران.

**چرقەچرق**: کەلەکەل، قرچقرچ، پێچەوانەکراو، شەقەشەق، چەق وچۆقی ددانانە لەکاتی سەرما یا تاولەرزێدا.

**چرک** (باک.): مرەبای میوەیە. زۆر، گەلەک. (دەر.، فە.) کێم، هەوا. (لو.، خۆ.): چڵک. (باک.، هەورا.) چرگ، چیکەنە، خەرەک، چرغ، چەکەی هەلاج، ماشێنەی هەلاجییە. (باک.) سوولاوک. (باک.) غەرغەرە.

**چرک** (باد.): شیوێکە بریتییە لە پەنیری لە ناو رۆنیدا سوورکراوەوە. خورماورۆنێکە لە باتی هێلکە پەنیری تازەی شیرینی تێکرابێ، چێرک. مەڵحەم، مەرهەم، (موک.) هەتوان، ـــ ا سماقی: هەویری ترشی. چەکە، شیلەی ترێ هێندە بکولێنرێ تاوەکوو داوەدەزوو باریک دەکشێ، دۆشاوی دووجار کولاو.

**چرکاندن**: قرچاندن، تەقاندنی چەک بەبێ فیشەک. (باک.) لۆکە لەخەرەکدان.

**چرکاو** (خۆ.): چڵکاو.

**چرکە** (بابا.): خەست و پەیت بوونەوەی دۆشاو و ئیتر. جمس، جووڵە: ـــ ی نەکەی: نەجوڵێی، (هەورا.) چرتە، دەنگی کەژمێرێ. قرچە، دەنگی شکان و درزبردنی دارانە، ـــ ی بن میچ: قرچەی بن میچ لە بەرگەرمایە. دەنگی جوولانی زارە لە کاتی ئاخەفتندا. قرمە، دەنگی تەقین و تەقاندنی چەکانە.

**چرکەچرک**: قرچەقرچ، چرکەچرکی یەک لە دووای یەکتری، دارێکە درزی بردبێ و تلێشەکەی لە میچیدا پتربێ ـــ ی لێدێ، سادارەکە لە میچیدا بێ یا گرانایێکی لە سەربێ. چرتەچرتی کەژمێرێیە.

**چرکەکردن**: جوولان، جوولانەوە.

**چرکڤان** (باک.): چرکەوان، خەرەکەوان.

**چرکن**: چڵکن.

**چرکنە** (باد.): باڵندەیێکی زۆر گچکەیە لە نێو پەرژیناندا دەبینرێ و بەرسینگی زەردە.

**چرکوهوڕ**: چرکەچرکی زۆر.

**چرکیژن**: چریکە.

**چرکیان**: چرکەکردن، کرچەکردن.

**چرکیانەوە** (ئەردە.): جوولانەوە، جوولەکردن.

**چرکین** (باک.): لەچرکدراو. چڵکن.

**چرگ**: (جا.، هەورا.) مێشەسی، چێرگ، تەواو قەلەموونەی کێوییە، (باک.)بەن، رەنگی ـــ سپی و سووری هەیە. (باک.) زوورچکە، گیایەکی تۆودارو وورد و کورتە لە مێرگان شین دەبی.

**چرگاو**: جێگایەکە پرلە دارو قامیش و گیاو ئاوبێ.

**چرگە**: جێگای چر.

**چرگەر**: گۆرانی بێژ، بەندبێژ، چیرۆکبێژ، رازوێژ، خوێژ، چاوەش، ئاوازەخوان.

**چرمسان**: پووچ بوون.

**چرمسانەوە**: پووچ بوونەوە لە بەر لاوازی، چرووسانەوە.

**چرمساندن** (رەوا.): چتێکی رەق نەرم و شلکردن.

**چرمساندنەوە**: پووچ و پووتکردنەوە، چرووساندنەوە، لەرولاوازکردنەوە.

**چرمن** (هەورا.): چڵمن.

**چرنەوپەرنە**: چەرین و پەلەوور.

**چرنە** (چرنە): ئەو ئاژاڵ یا ماڵات و وولاغ و چوار پێیانە، کە دەلەوەڕێن.

**چرنگ** (باک.): دەنگی لێدانییە، هاشەهاش و چرنگەی گوورێیە.

**چرنگە**: دەنگی لێدان و کەوتنێیە.

**چرنگین** (باک.): زەنگلێدان.

**چرنووک** (کۆ.): چنگوڕک، سەری نینۆکی تیژ.

**چرۆ** (هەورا.): چڵوو. (کۆ.) پشکۆژە، گۆپکەی دارانە لە پێش گەڵاکردندا.

**چروو**: چڵوو، لق وپۆپی دارانە بە گەڵاوە.

**چرۆت** (باک.): بێکار. ـــ ی: بێکاری.

**چروچاو**: چرچەنە، چرووچەم، دەم و چاو، روخسار، روو، چارە، جارجارە بۆ سووکی بەکاردەبرێ، بەیەکادان.

**چرووچاوترشانن**: چروچاوتێکنان.

**چرووچاوبەیەکادان**: خۆ گرژ و مۆن کرن، چروچاوتێکنان.

**چروچەم** (هەورا.): چروچاو، روخسار.

**چروچەنە** (ئەردە.): چروچاو.

**چرووز** (بابا.): بنیە، بنچینە، بونیە.

**چرووس** (باک.): چرووسکە، تروسکە، رووناکییێکی زۆر گچکەیە لە دوورەوە بنوێنێ، زیلەمۆ.

**چرووسان**: لاوازبوون، (کۆ.) چرۆسان، (باک.) ئەنرین، ئەرنان، ئەنران، ئازارکێشان، ئەرک کێشان، لاوازبوون لە بەر نەخۆشی یا لەبەر کار زۆری.

**چرووسانەوە**: چرۆسانەوە، چەوسانەوە، ئازارکێشان، کرووزانەوە، ئارام نەگرتن، لاوازبوون.

**چرووساندن**: ئازاردان، رەنجدان، ئارام لێهەڵگرتن.

**چرووساندنەوە**: ئازاردان، رەنجدان، چەوساندنەوە، ئارام لێهەڵگرتن، تەنگاوکردن، ئەنراندن، (باک.) ئەرناندن، چرمساندنەوە، پووچ و پووتکردن.

**چرووساو**: خەفەت و ئازار چێژتوو.

**چرووساوە**: خەفەت و ئازار چێژتوو، چەوساو.

**چروساوەوە**: خەفەت و ئازار چێژتوو.

**چرووسکە** (خۆ.): رووناکی و شۆقێکی زۆر باریک و کەمی رۆژ یا مانگ و ئەستێرە یا ئاوور و شووشەو ئیدیکەیە، چرووسی، تروسکە، چسک، چیک، تریسکە.

**چرووسکە چرووسک**: تروسکە تروسک.*

**چرووسی** (باک.): چرووسکەی ئاوور و ئیتر.

**چرووک**: کەم دیتە، پەست، ڕژد، پنتی، چەپخووس، دەخەڵ، قەڵب، قرچۆک، قرنۆک، پیسکە، چەپەڵ، (باک.) چکووسە، (ئەردە.) کەنەفت، چلووک.

**چرووک**: ناقایم. ئەوکرە ـــ ە: ناقایە.

**چرووکاندن** (ئەردە.): ترووکاندن.

**چرووکان**: چرووکاندن.

**چرووکە** (ئەردە.): هەست و خوستێکە لە کاتی چرووکاندنەوە پەیدا دەبێ، (ئەردە.) دەنگی لێکدانی چەقۆیە.

**چرۆلە**: (؟).

**چروولە** (شا.): چیلکەی نیوە سووتاوە بەرانبەری سەلکەبزووتییە.

**چروونەک** (باک.): سوولاووک، پلووسک.

**چرۆنەک** (باک.): پەنهان، ـــ دان خووە، خۆپەنهانکردن.

**چری** (باک.): جوورە گەمەیەکە.

**چری**: (بار.، کە.، باک.) ـــ ا پێشی: گەڵاڕێزان، خەزەڵوەر، مانگی نێوەڕاستی پاییزە. ـــ اپاشی: کەوبەردار، سەرماوەز، مانگی دوایی پاییزییە.

**چریانێکی** (باک.): تشرینی یەکەم.

**چریا پاشی** (باک.): تشرینی دووەم.

**چریان** (باک.): پچەڕان، دڕان، بچڕە: بپچڕە، بدڕە.

**چریاندن** (باک.): پچەڕاندن، دڕاندن.

**چریەی** (هەورا.): بانگ کردن، گازکردن.

**چرێژان**: پرێشک ئاوێژتن.

**چریسک** (باد.): پۆلـو پزیسکە هەرە گچکەکانی ئاوریە لەناو خۆڵەمێشیدا. (باد.) پریشکی ئاوورییە، ڕووناکی و ترووسکەی ئاوورییە.

**چریسکان**: تروسکان. ـــ دن: تروسکاندن.

**چریسکە** (دەر.، باد.، ڕۆژ.): پرشەنگ، تروسکەی ڕۆژی یا چتی تر، بریقە، تریسکە.

**چرێش** (باک.) شرێز، (دەر.) ئەسرێلک، (خۆ.) ئەسترێلک، (هەورا.) سرێش، سترک.

**چرێش**: گیایەکە بنەکەی ووشک دەکرێتەوە و دەکوترێ وەکوو گیراوەوەی کەتیرە بۆ بەرگ تێگرتنی پەرتووک و چتیتر بە کاری دەبەن، بەگیایەکەش و بنەکوتراوەکەشی هەردەڵێن ـــ .

**چرێشاوی**: مەزەڵۆ.

**چریغ** (ڕۆژ.): تەشی، چرگ.

**چریفیت** (باک.): هەڵبەزینەوە.

**چریق**: دەنگی لێدانییە.

**چریک**: چیکەنە، خەرەک، چەرخێکە بە بادان پەمۆدانە لە پەمۆ جووێ دەکاتەوە. (باک.) چریکە، دەنگی باڵندانە.

**چریکاندن**: چرین، قیژاندن، زریقاندن، زیکاندن، هاوارکردن.

**چریکە**: هاوار، قیژە، زریکە، زیقە، چرکیژن، بانگ. هاوارێکە لە بەرێێش یا لەکاتی لێقەومانێدا. داستانی قارەمانانی پرشۆر، کە بەهەڵبەست دانرابێ یا بە پەخشان. ئاوازە، دەنگی خۆش، گۆرانی، تێهەڵکردنی گۆرانی. دەنگی بولبول و بازو هەڵۆ، شاهەڵۆی نیشتمانی کوردستان دەچریکێنێ بۆی بەسەد ئاهەنگ. دەنگێکە لە پڕ ابێت، گوریژن. ـــ ی برینان: ژان و ژوواری لە پڕایەتی.

**چریکەچریک**: قیژەقیژ، زریکە زریک، هاوارهاوار، هاواروبانگ، چریکەی یەک لە دووای یەک. جیکەجیکی باڵندان.

**چریک و هۆر**: چریک و هوور، چریکەی زۆر، جریوەی چۆلەکە.

**چرین** (گورا.، کە.، ڕۆژ.، هەورا.، لو.، دەر.): (باک.) هەڵبەزینەوە، درۆکردن. بانگکردن، گازکردن، (دەر.) چرینەوە، قیژاندن، هاوارکردن، هۆرەکردن، نێوی دەنگە. گۆرانی یا حەیران و لاوک یا بەستەکوتن. (باک.) دڕان.

**چرێن**: شووێنی چڕ، چۆڵ، دەشت. گۆرانی بێژ، هاوارکار.

**چرینگە**: ترینگە.

**چرینگەچرینگ**: ترینگەترینگ، دەنگی داسییە، کەوە قەرسیلی دەکەوێ، قاپ و قاچاخی مسیش، کە وێک دەکەون ـــ ی لێوەدێ.

**چریوە**: زریوە، جووکە، جیکە، زریوەی چۆلەکەو بێچووە باڵندەی ترە.

**چریوەچریو**: جیوەجیو، جیکەجیک، زریوەزریو.

**چز** (باک.): مرۆڤێکە تووکی خورمایی بێت. (باک.) زەرگەتە. (باک.) قوماربـاز لە بردنـەوەی قومـارێدا دەڵێ ـــ لـەمن. (ڕۆژ.، فە.) چـزووی دووپشک و زەرگەتە و ئیترە. چزوو، کلکی دووپشک و چزووی زەردەواڵە وهەنگ و ئیترە، کەبە هۆی وانەوە بەگیان لەبەرانەوە دەدەن. ـــ ی هەڵسان: واتە پێیەوەدا.

**چزز** (هەورا.): نیشانە، دامغە، چزخ. ـــ کردن: نیشانە و دامغەکردن. دەنگی سووتانێ یا برژاندنی گۆشتییە.

**چزال** (باک.): پارچە.

**چزان**: پێوەدران، گەزران، سووتانی بەشێک لەلەشی گیان لەبەران بە ئاوور یا بەکانێکی داغ.

**چزاندن**: پێوەدانی دووپشک ومار و ئیتر. سووتاندنی لەش یا چتێکی تر بەئاوور یا بەکانێکی داغ و سووربووەوە. پێوەدانی دووپشک و ئیتر.

**چزانن**: چزاندن، پێوەدان.

**چززە**: چزووی دووپشک وئیتر. کززە، قرچە، دەنگی گۆشتی سوورکراوەوە یا برژاو، تنۆکێک چەوری لە بەر ئاوور بکەوێ یا تنۆکە ئاوێک لە نێو ڕۆنی داغ بکەوێ ـــ ی لێدێ: قرچە یا کززەی لێدێ، ئاوور وە لەشیش بکەوی ـــ ی لێوەدێنێ.

**چزە**: زیان. ـــ دان: زیاندان. (ئەردە.) دزی. (هەورا.) چزوو.

**چزەپیلە** (جا.): دووپشک.

**چزەچز**: کززەکزز، دەنگی برژانی گۆشت و قرچانی ڕۆنە، چزەی یەک لە دووای یەکتری.

**چزەلێهەستان**: چززەو کززە لێهەڵستان، مەبەس لە ئێش و ئۆفێکی ناکاو گەیشتنە بەیەکێک، چزە لێهەڵسان.

**چزەلێهەڵسان**: چززەوکززەلێهێنان.

**چزەلێهەڵساندن**: پێوەدانی دووپشک و ئیتر، ئازار و زیان پێگەیاندن، چزەلێهەستاندن.

**چزەوپیڵە:** دووپشکی مام ناونجی.

**چزیێدان** (ئەردە.): بڕێتییە لە درێژکردنەوەی ئاخەفتن و قسە.

**چزچاو** (کو.): گۆشەی چاو.

**چزخ:** (هەورا.) چز، نیشانە، ـــ کردن، ـــ کێشان.

**چزکردن:** کووژاندنەوەی چتی نووسراو، خەت بەسەرداهێنان.

**چزلک** (هەورا.): چزیلک. (هەورا.) کێردی بەرخەنجەرێ.

**چزڵیە** (هەورا.): کێردی بەرخەنجەرێ.

**چزڵیک** (ئەردە.): چزیلک، ئەوپارچە دووگە ووردانەیە، کە دوای سوورکردنەوە و ڕۆن لێگرتنی لەناو تاوەیدا بەووشکی دەمێننەوە.

**چزلێهەلسان:** کرزەو قرچەلێهەستان.

**چزمە** (باک.): جزمە، چەکمە.

جزمە

**چزرین** (باک.): ژاکان، سیس و چرچ و ووشکبوونی لێو وگوڵ و گیا لەبەر بێ ئاوی.

**چزوو:** (ڕۆژ.) چز، چزی کولاژدم، (باک.) باوەزیرک، درێشوکە، چزووی دووپشک و درێشەی ژەنگە سوورە و زەرگەتەو مێشە نگوین و ئیترە، دووپشک درێشەی پێوەدانی بە سەری کلکییەوەیە.

**چزووبز:** مەبەس لە گۆشتی برژاو یا سووروەکراوە.

**چزوپیڵە:** سوولسوڵە، جوورە دووپشکێکی مام ناوونجییە.

**چزوهوڕ:** چزوهوور، چزەچزی زۆر.

**چزیان** (ئەردە.): سووتان، سووزیان. (باک.) چزین، (ئەردە.) چزان، پێوەدران، گەزران.

جزیزەرک

**چزیزەرک** (باک.): باڵندە.

**چزیلک:** چسکە، کزکە، کسکە، چزلک، چزڵیک، (کۆ.) کزیلک.

**چزین** (باک.): هاشەی ئاوێ، قەد، تیڕا. (باک.) ژێ چزین، لەوی بەقەد، لەوی تیڕا.

**چس** (ڕۆژ.): دەنگێکە بۆ دەرکردن و ئاژۆتنی مەڕانە، چش، چشش، (ڕۆژ.) چیس.

**چست** (باک.): چێژ. ـــ کرن: چێژتن، چێشتن.

**چستە** (باک.): کارزان، مەحلان، جەرجە، زرنگ، لێهاتوو.

**چسک** (باک.): زوو، گورج، پەلە. (باک.) چروسکەی ڕووناکی.

**چسکان** (بابا.): بەناووری چزە لەدەست یا لاقی هاتن.

**چسکە** (بابا.، شا.): چزیلک.

**چش:** چشە، وەش، وەشە، بۆدەرکردنی وولاخان بەکاردەبرێ. ووشەیێکە لەکاتی دڵگیری یاناهومێدیدا بەکاردەبرێ و قیرسیای لێدەکرێ. (هەو.) چاوپۆشی، لێگەڕان، (ڕۆژ.) چس، چیس، چشە، چسە، هیچ، قیروسیا، قیرسی، (هەو.) تخ.

**چشت** (هەورا.، کە.، دەر.): شت، چتومەک، چت، هێن.

**چشە** (ئەردە.): هنگ، فەرمانە بۆ ڕۆیشتنی وولاخ.

**چشت** (ڕەوا.): زگ، تۆل، بە ـــ ە: ئاووسە، زگی پڕە.

**چشتر:** (کە.) چیتر، بزنێکە لە گیسک گەورەتر و هێشتا نەبوبێتە بزن.

**چشتێک:** چتێک، شتێک. چەشتێک؟، چی؟.

**چغ:** چغە، ووشەیێکە بۆ دەرکردنی سەگان بەکاردەبرێت. (بار.) تووکی سەر نێوچاوانە، چخ، چخە، چغە.

**چغاچغ** (باد.): گێڕانەوەی دەنگی هەندێ لە باڵندان.

**چغارە** (باک.): جگەرە، جگارە.

چغارە

**چغاندن:** چغەکردن.

**چغە:** چغ، چخە، بۆ دەرکردنی سەگان بەکاردەبرێ. ـــ کردن: چغەکردن، چغاندن.

**چغەچغ:** چخەچخ.

**چغچغ:** چخ چخ. ـــ کردن: ووتەیەکە بۆ دەرکردنی سەگ.

**چغراندن** (باک.): هاندان.

**چغل وبەد:** مرۆی زمان خراووپیس.

**چفانن** (ئەردە.): چغەکردن.

**چفە:** سرتە، بەسرپە ئاخۆتن، چپە، پچە.

**چفەچف:** سرتەسرت.

**چفت** (باک.): ئازاری مەمک، جووت، جفت، دووان. (باک.) ئازاری جادوو، شووم. (ئەردە.) ئاڵقەرێز.

**چفتە** (باک.): ڕەنجەڕۆ، فەلەکزەدە، بەدبەخت. (باک.) تفەنگی ڕاوێ، جفتە.

**چڤ** (باک.): هەڵبەز، چڤ لخوەدان: هەڵبەزین، فێڵ و فەرەج، ئارداف، ناز، تەشقەڵە. چەمانەوە. ـــ کردن: چەمینەوە. (باک.) دەنگی گوللەیە. (ئەردە.) چفە.

**چڤات** (باک.): کۆمەڵ.

**چڤاندن** (باک.): چەماندن. (ئەردە.) بەسرتە بە گوێ هەڵێنان.

**چڤە** (هەورا.، بابا.): سرتە، هەست و خوست.

**چڤەچڤ** (هەورا.، بابا.): سرتەسرت، هەست و خوست.

**چڤر** (باک.): چەوور.

**چڤک** (باک.): لکەداری چکۆڵە. شووانەهەڵخەلەتێن، (باڵندە).

**چڤناک:** چەماوەوە، داهاتوو، خووار بووەوە.

**چڤۆ** (باک.): فێڵباز، تەشقەڵەباز، فێڵزان، ساختەچی.

**چڤۆنی** (هەورا.): جووانی، جحێڵی.

**چڤی** (باک.): قەڵەمی مۆرچییەتی.

چڤی

**چڤیک** (باک.): باڵندەیێکە لە چۆلەکەی گەورەترە.

**چڤین** (باک.): فیتوو لێدان، خووار بوونەوە، چەمانەوە.

**چق** (باک.): قرچە، قرچەی شکانییە. قوڵی چۆمانە، خڕ، کەند. (باک.) لکی دارانە.

**چقا** (باک.): چەند، چقا پەزێ وەهەیە: چەند ئاژاڵتان هەیە؟.

**چقاس؟** (باک.): چەند؟، هێندە، (بۆ پرسیارە)، من ـــ ژێرە گۆت: ئەمن هێندەی پێم گۆت.

**چقاندن** (باک.): لە گەمەی جگێنێدا فێڵێکە.

**چقە:** جقە، قامکێکە لەپێی کەڵەبابی دەردەکەوێ دووای تەمەنی ساڵێکی. پەڕێکە وەکوو تاووس و ئیتر پادشایان لە تاجەکەیانی دەچەقێنن.

**چقەچق** (باک.): چەقەچەق، گێڕانەوەی دەنگی جوولاّنی هەندێ چت.

**چقچق** (باک.): قرچەقرچی گۆشتییە، کە لەناو ڕۆنیدا سوور دەکرێتەوە.

**چقچقاندن** (باک.): قرچاندن و سووتاندنێکی زۆرە، (باک.) قچقچاندن.

**چقر** (موک.): خاچ، دەلۆی خالّدار.

**چقلّ** (شار.): درِوو، قەلّچغ، دڕکی گەورە، تیسمالّکی دار، پووش و ئیدیکە. بژی گوڵی گەنم و جۆ و ئیدیکە، (ڕەوا.) داسی.

**چقل** (باک.): لک، لق. (هەورا.) بەردەلاّن.

**چقلاّوی**: درِاوی.

**چقلّەکەلّەوی** (بابا.): درِووە زەردە،گیایەکە.

**چقلّۆک** (باک.): باسکی چکۆلّەی ڕووبارو چۆمانە.

**چک** (ئەردە.): زللە، شەقەزللە، شەپەلاّخە، سەپلاّخە. هەلّکەوتوو، ناوێزە، (ئەردە.) دلّۆپێک لەچتی شل، شەپازللە. (موک.) لای قوونی جگییە، لە هەندێک شوێنانیش بەلاّموولاّییێکەی بەرینی دەلّێن، بەختەوەری هاتە بۆ جگ بەکاردەبرێت. (جا.، ڕۆژ.) پت، کەم، نەخت، تۆز، چکێ: پتێک، تۆزێک. ووشک، بڕان. ـــ بوون: ـــ بوونی ئاوو بارانە: وەشان، وەشانەوە، وەستان، ڕاوەستان، ووشکبوونی دلّۆپەو تکەی ئاو. (باک.) بە تالّووکە، ئامادە، ساز، خووە ـــ کرن: خۆئامادە وسازکردن. مشتە، کوتک، چەکوچ. وووریا، ووشیار.

**چکا** (با.): داخووا، ئاخۆ، مرازی پرسیارو بانگکردنە.

**چکان** (باک.): چێشتێکە زۆر بکوڵێ و ئاوی کەم مابێ. (باک.) ئاو لە شیناوەردێ بڕان. (باک.) دلّۆپەڕاوەستان و ووشک بوون، ووشککردن، ئیشک بوونی ئاو یا بارانە و ئاوی بیر و کارێز و ئیتر، مچکین، چکیان. (باک.) چۆڕانەوە، (باک.) تکان.

**چکانەوە**: چۆڕانەوە، تکانەوە. کوڵانی شلەمەنی لە سەر ئاوور بە پلەیەک تاوەکوو دۆشاوی پەیت دەبێتەوە.

**چکاندەرە**: جوورە گەمەیەکە.

**چکاندن** (باک.): مچکاندن، ووشککردنی دلّۆپە و هەموو جوورە تکەیەکی ئاوێ، چۆڕاندن، تکاندن، چکیاندن. (باک.) ڕوواندنی چت، چەقاندنی دار و چتی تر.

**چکاندنەوە**: چکاننەوە.

**چکانن**: چکاندن.

**چکاو**: چۆڕاو، تکاو. ـــ وەوە: چۆڕاوەوە، تکاوەوە.

**چکە**: چک، تکە، تنۆکەئاو، دلّۆپە، دادانی ئاوە لە کوندەو مەشکەو تەنەکەو دەفرانی کانی و گلێ یان لە خانووانەوە لە کاتی بارینی بارانەدا.

**چکەیی** (باک.): دارە بیی ووشک.

**چکەچک**: تکەتک، چۆڕەچۆڕ، نێوی دەنگی تکانی ئاوییە. نێوی دەنگی باڵندەو کەزمێرێ و ماشێنانە.

**چکەکردن**: تکەکردن.

**چکەلّە**: گچکەلّە، تۆزلاّنە، نەختەلاّنە.

**چکچکاندن** (باک.): قۆڵ لێهەلّکردن بۆ شەڕی یا خۆچەکدارکردن.

**چکچکە**: لە نێوشاخ و چیایاندا بە شوێنێکی دەلّێن، کەچک چک و تک تک ئاوی لێ بتکێ.

**چکچکە** (هەورا.، ڕەوا.): پندریسکە، فندەگولە.

**چکچکۆک** (باک.): باڵندەییێکە.

**چکرم** (ئەردە.): چتێکە بەزەویدا چەقێنرا و واتا لەزەوی کوترابێ وەکوو بزمارو مێخسنندان.

**چکزین** (باک.): چاڤزۆرک، بەدگومانی. ئەنتوپەهت بوون.

**چکلّ** (بابا.): چەقێن. چیلکە، چکولّ.

**چکلان** (باک.): چەقانی ئالاّودارو ئیتر. ـــ دن: چەقاندنی ئالاّو دار و ئیتر.

**چکلەچزێ**: مەبەس لە پەیدا کردنی چتە بەکەم و کووڕی و بەرەنجی شان و ئارەقەی نێوچاوان.

**چکمەساو** (ئەردە.): باقەییێکی گەورەیە لە گیای درِووەوە.

**چکۆ** (باک.، باد.): چونکوو، چونکی. لەکووێ؟، کووێندەرێ.

**چک و پک** (موک.): لە کاتی کایەی جگێنێدا بەکاردەبرێ.

**چکووڕاندن** (باک.): هەلاّمساندن، باپێکردن. (باک.) گرژو چیندارکردن.

**چکوورین** (باک.): شەپۆل لێدان.

**چکۆس** (باک.): ڕژد، بەرچاوتەنگ. ـــ ی: ڕژدی، بەرچاوتەنگی.

**چکۆلّە**: تووژک، تیژک، (باک.) خووردە، تیژک، گچکە، کچک، گچکۆلّە، ووردە، ووردەلّە، هوورک، ووردیلە، بچووک، بووچک، گولاّلّە، پت، پتکۆ، (باک.) پتۆ، بچووکەلّە، بچکۆلّە، چووک، چووکەلّە، بوچکەلّە.

**چکۆلّەیی**: بچووکی، بەندەیی، بچووکاهی، بچووکێتی، منداڵێتی، گچکەیی.

**چکۆن** (هەورا.): لەکووێیە؟.

**چکێ**: تۆزێ، نەختێ، کەمێ، پچێ.

**چکیان** (نەه.، شکا.، باک.): چکان، دلّۆپە ووشک بوون.

**چکیاندن**: چکاندن، دلّۆپەووشککردن.

**چکێک**: چکێ.

**چکین** (باک.): ووشکبوون، بڕان. ـــ ی بارانە: ڕاوەستان ووشکبوونی بارانە، بهنامن ژبەر چکیا: پشووم بڕا.

**چگا** (فە.): گرد، تەپە.

**چل**: چەل، چهل، (٤٠)، چل ویەک (٤١).

**چلّ**: زەلّ، زل، پت، (هەروا. کۆن) تل، لق، تەنها بۆ تاکە گیا یا پووشێک بەکار دەبرێ. (باک.) زگپەرست، قرمدار، چاوبرسی، زۆرخۆر. (باک.) پێچراو، خووار. (ئەردە.) گێل، گەوج، فل، پەخمە. دووجار بیست، چەل (٤٠). باڵندەییێکە، چەکچەکیلە (بەلامی قەلّەو). تروان، پلدان، (هەورا.) قولّدان، (دەر.) تریوینک. ـــ دان: (هەو.) پتدان، لێدان و هەلاّوێژتنی بڕینان یان جولاّنی جێگای هەلاّمساوە، کە کێمی تێدابێ. لکەدار، چەلاّک، دارێکی ڕاست و درێژە بۆلێکردنەوەی مازوو و گوێز لە لکە بەرزەکانی داران. چیچە، شاقوت، گۆی مەمک. ـــ ی گووان: گۆی مەمک. چلّی دارو گیا، لکی دار.

**چلاب** (باک.): زنجیری زێڕ.

**چلاسک**: چلۆوسک، سەرەبزووت، داری نیوەسووتاو، چلۆسک.

**چلاک** (باک.): چەلاک، (باک.) چلەک، دارێکی درێژەو سەرەوەی دوو پەلە دەدرێتە بەرکری دەواران. (باک.) کوتەک، دارێکە بۆ شەڕ، داردەست.

**چلاک** (ئەردە.): نەمامی داران.

**چلافن** (ئەردە.): لێکۆڵینەوەو ووردبوونەوە لە چتێک و ئامادەکردن، دروستکردن. شێلان، ماڵین.

**چلاڤن** (ئەردە.): تروکانن، تروکاندن.

**چلاو**: (کۆ.) چەلاو، جوورە پلاوێکە.

**چلاوپەز**: ئاشپەز، چێشت لێنەر.

**چلە** (موک.): میوەی تەڕە، چلێسی، زۆر خۆری، تروکەو هەنایی چاو، ـــ ی: تروکە، چلەی چاو، چاوی دێ: بە ئاستەم چاوی تروکەی دەکات. چەلاک، چلاک، دووشاخە.

**چلە** (چللە): ـــ ی هاوینی: لە نێوەڕاستی هاوینێدایە، ـــ ی زستانێ: سەیدک، (کە.) خەفتیان، چل ڕۆژ لە نێوە ڕاستی زستانێدا، ـــ ی زەیستانان: ماوەیەکە بۆ ژن، کە منداڵی بوو تاچل ڕۆژان. (فە.) گوریسی ئەستوورە لە موو دروستدەکرێ. بە تێپەڕینی چل ڕۆژان دەڵێن دووای بوونی منداڵێکی یان دووای مردنی یەکێکی یا پاش گوێستنەوەی بووکێکی، لە شوێنێکی نەدیوو پەنهانیشدا تاماوەی چل ڕۆژان خودا پەرستی تێدابکرێ ـــ ی پێدەڵێن. بە پێی ڕێبازی کوردستانی باکوور: لەمزستانێدا ۲۰ ڕۆژی کانوونی یەکەم و بیستی کانوونی دووەم دەکاتە چلەی زستانێ، چلەی هاوینیش بەو چەشنەیە: ۲۰ ڕۆژ لە تەباغ و ۲۰یش لە تەمموزێ، لە چلەی زستانێدا سەرما زۆر سەخت و لە هی هاوینێشدا گەرما زۆر بەتین دەبێ.

**چلەبەنان**: بریتییە لە چەند دەوارێکی زۆر بە پری بە یەکتری داهەڵدرابن بە جوورێکی کەچلە گیری دەوارەکان بە ناو یەکتریدا چووبن.

**چلەبچووک**: چل ڕۆژەکانی دوو ایی زستانێیە.

**چلەبڕ**: بەحاجی لەگلەک و باڵندەییەکی تر دەڵێن، کەلەپێش کاتی خۆیدا گەڕابنەوە کوێستانێ. ـــ کردن: هاتنەوەی لەگلەگو باڵندەی تر لە چلەی زستانێدا.

**چلە بووچک**: چلەی گچکە.

**چلەپایە**: دیلانێ.

**چلەپۆپە**: لق و پەلی زۆر بەرزی درەختانە.

**چلەپۆپەی درەخت**: چڵ و پەلوپۆی هەرەبەرزی دار و درەخت. *

**چلەچڵ**: تڵەتڵ، سووتانەوەی برین، نێڵەنێڵی ئاوورییە.

**چلەخانە**: شوێنێکە چلەی تێدا بگیرێ بۆخودا پەرستی.

**چلەدار**: منداڵێکی تازە بووبێ چلەی تێنەپەڕیبێ. ئافرەتێکی زەیستانە، کە هێشتا چلەی نەچووبێ.

**چلەدان** (ئەردە.): چیکڵدانە، چیقڵدانە.

**چلەدانک** (باک.): چیکڵدانە.

**چلەشۆر**: بارانی ڕێژنەی دووای چلەیە.

**چلەک** (باک.): تووی فەرەنگی. زۆرخۆر، چلێس، لاواز، بێ تین.

**چلەکان**: داچڵەکان، شڵەژان، خورپان، داخورپان. ـــ دن: داچڵەکاندن، شڵەژاندن، خورپاندن، داخورپاندن.

**چلەکاو**: شڵەژاو، داچڵەکاو.

**چلەکە**: چلە، چلاک، دووشاخە.

**چلەکی** (باک.): زۆر خۆری، زۆر خۆرێتی.

**چلەگە** (شارە.): ئەستوندەی کورتە لە داوێنی دەوارو ڕەشماڵاندا دەدرێتە بەر ئەو گوریسانەی، کەبە مێخی دەوارەکەوە بەستراوون لە کاتی شل بوونەوە یا داتەپینی دەوارەکە دا بۆ ئەوەی، کە گورجی بکاتەوە.

**چلەگەورە**: چل ڕۆژەکانی سەرەتای زستانێیە.

**چلەوەزی**: چزلێک.

**چلەوورچ** (ئەردە.): ۲۵ ڕۆژ لە مانگی (جدی) تێپەڕێ (وورچ) دەچێتە ناو کونی خۆی ۲۵ ڕۆژیش لە سەرەتای (حمل) بمێنێ دێتە دەرێ ئەو چل ڕۆژە سەختترین ڕۆژانی زستانێیە.

**چلەم**: چلپەم، بۆئەوە بەکاردەبرێ، کە لە پلەی (چل) ی دابێ.

**چلەمین**: چلپەمین.

**چلەی بچووک**: چل ڕۆژەکانی دوو ایی زستانێیە.

**چلەی گەورە**: چل ڕۆژەکانی سەرەتای زستانێیە.

**چلەردە**: هەستان و دانیشتنی چل جاران لە سەر یەکتری لە ماوەی هەنگاوێکیدا بۆ هەڵگرتن و دانانی بەردێک لە چل بەردان تا تەواو دەبێ.

**چلپ** (باک.): وەکوو چپ وایە بۆ سووکی بەکار دەبرێ، فێڵ، ساختە.

**چلپاندن**: فێڵ و فەرەجکردن، خوواردنەوەی ئاوی سەگانە بە زمان. (باک.) لێکردنەوە، پەڕاندن.

**چلپانن**: چلپەچلپ و دەنگی ئاو خوواردنەوەی سەگ و پشیلە. (ئەردە.) چەکاندنی مەمک، مژین.

**چلپاو**: قوڕاو، پیساو، چڵکاو، زڵقاو.

**چلپایی** (فە.): هەزارپێ.

**چلپە**: چەکاندنی مەمک و گووان، دەنگی خوواردنێکە، کە بە چاوچنۆکی پەیدا بکرێ و هەڵ بلووشرێ. (شا.) شڵپەی ئاوێ. (ئەردە.) لەپلەپ، بەدەنگی ئاو خوواردنەوەی سەگ و پشیلانیش دەڵێن.

**چلپەچلپ** (شا.): شڵپەشڵپی ئاوێ، لەپلەپ، چلپەی یەک لەدووای یەکتری، چڵپ چڵپ.

**چلپەرە** (باک.): گیایەکە.

**چلپ و لێس**: دەنگی لستنەوەو هەڵ لووشینی چت، لستنەوە.

**چلتووک** (باک.): چەڵتووک.

**چڵتووکجاڕ**: چەڵتووکجاڕ، (ئەردە.) شالیگا، لەرەزە.

**چلچەنگ**: چەنگاڵ، ئاسنێکی چنگدار پەلپەل بە تێڵەوە دەبەسترێت تا، کە نێچیر بە تەڵەوە بوو نەتوانی تەڵەکە ڕابکێشی چونکە چنگی چلچنگەکە لە چتی گیر دەبێ نێچیر بۆی ڕاناکێشرێ.

**چلچرا**: چەند پارچە ئاوێنەیەکە لە تەنەکەیەکی دەگیرێن و چرای پێدا دەکرێ بۆ ڕووناکی.

**چلچەنگ**: چلچنگ، شانە.

**چلچلە** (بابا.): باڵندەیەکی بۆرە وەکوو پەرەسێرکەی وایە.

**چلچنگ** (هەورا.): شانە.

**چڵدان:** (هەو.) پتدان، (بابا.، هەورا.) پلدان، تلدانی برین، (دزە.) تروان، (هەورا.) قولدان، (هەو.) تروانـدن، (فـە.) وورک، لێدان و هەڵاوێژتن و جووڵانی برینان یا جێگای هەڵامساوە، کە کێمی تێدابێ.

**چلدانە:** ـــ ی سەرگۆڕان.

**چلفڕاندن** (باک.): دڕاندن.

**چلفڕە:** گۆشتی سوور کراوەوەیە.

**چلفرین** (باک.): دڕان.

**چڵک:** (خۆ.) چرک، (باک.) قرێژ، (ئەردە.) زیرگ. کێم و هەوا و زووخاوی برین.

**چلک** (باک.): هێندێک، بارێکی گچکە، باراشێک.

**چڵکاو:** ئاوی شلوێ و چەورو چەپەڵ، کە لە چتمەک و دەفری چڵکنی شۆراو لێپەیدادەبی. (خۆ.) چرکاو، چڵپاو، قوڕاو، زلّقاو، بەساو، ئاراو، لیتە، هەڕگاو.

**چڵکاوخۆر:** پاشماوەخۆر، کاسەلێس، کەسێکە بەدژی نەتەوەی خۆی ڕاژەی بێگانان بکات.

**چڵکە:** چڵەکە، تەکان، سڵ، سڵەمە، ڕەو.

**چلک دیانی:** چڵکی ددان.

**چڵک گوێچکە:** سیمڕاخە، کرێژی گوێیان.

**چڵک مردە** (ئەردە.): چڵکەسوو، کەل و پەلێکە ناپوخت شۆرابێ.

**چڵکن:** چرکی، ئاشوو، پڵکن، قرێژاوی، پیسکێر، زیرگن، چەپەڵ، نەگریس، لەشی چڵکن: دژوێن. ـــ ی: قرێژی، قرێژێتی.

**چڵکیانەوە:** سڵەمانەوە، چڵەکەکردن، داچڵەکان، تەکانخواردن.

چللە، چلە.

**چڵم:** (هەورا.) چرم. کڵم، (باک.) لیک، ئاوو تەڕایێکی توندە لە کەپۆ دێتە دەرێ، کە لنج و سوێرە، زۆخو گەرێزی کەپۆیە.

**چڵمەلەتە:** مەبەس لە ناوکی گوێزوبادام و نیترە، کە هێشتا شیرە بێ و خۆی نەگرتبێ ونەگەیشتبێ.

**چڵمسین** (زا.): ژاکان، سیسبوونی گوڵ.

**چڵمن:** (هەورا.) چرمن، گیاندارێکە چڵمی زۆربێ.

**چلمێر** (باک.): باڵندەیەکە.

**چلمیرە** (زا.): پشکۆڵی دەرگا.

**چلمێردە:** (ئەردە.) نووێل، دار یا ئاسنێکی ئەستوورە چتی قورسی وەکوو بەرد و ئیترلە زەویی پێ بڵند دەکەن. کۆڵەکەییێکە لە نێوخانووانداوەبەر میچی دەدرێت، نیرگە، دارێکە وەبەرداری شکاوی میچی دەدرێت بۆ بەرزکردنەوەی تادیرەکی وەبەر دەدرێت یا دەگۆڕ ـــ ڕێت.

**چلۆ** (زا.): چڵوو، گەڵای دارەبەڕوو ونیترە، کەبۆزستانی هەڵدەگیرێ بۆ ئالیکی ئاژاڵ و ماڵاتان. (باک.) چلۆن؟، بۆ پرسیارە. (باک.) چڵوو.

**چڵوو:**(باک) چلۆ، (هەورا.) چرۆ، (خۆ.) چروو، ـــ ی چکۆڵە: چڵووک، لکە گچکەکانی دارە مازوو و بەڕوو و نیترە بە گەڵاکانیانەوە. گەڵای دارانە ، کە تازەدێ دەربێ وبە قەد بادامێکییە، (کۆ.) پۆقرە، (شار.) چرۆ.

**چلوە** (هەورا.): جریوە.

**چلۆبڕ** (باک.): چڵوو وداری ووشک کۆکەرەوە، چڵووکار، چڵووکەر.

**چڵوچۆ:** هەوڵ و تەقەلا.

**چلو چووڤ** (باک.): چەماوەوە، خووار، پێچراوەوە.

**چلوچووڤی** (باک.): خوواری، پێچراوەوەیی، چەماوەوەیی.

**چڵ وچێو** (شارە.): هەژگ و هەژاڵ، چیلکەو پارچە داری ووردو کورت وەکوو شیشەی تووتن، چیلکە، داردەست، چیلکەودڕووی سووتاندنی،چوکڵە.

**چلوورە** (بابا.، شار.): (باد.) گلیلە، (بل.) سوولەڕمە، (کۆ.) مووم، (بار.) زەمەگلێرە، ژەکلێرە، (خۆ.) ڕمە، (هەورا.) بەیسە، ئەو شووشە سەهۆڵانەیە لە کاتی سڕی و بەستەڵەکێدا بە سوولاوک و گوێسووواندا شۆڕدەبنەوە، واتە ئاوێکە لە کاتی سڕوسەرمایەدا لە سەردەمی چۆڕانەوەیدا هەر لە حەواوە دەیبەستێ.

**چلوورە:** جوورە خواردەمەنیەکی سارد و شیرین و ڕەنگینە.

**چڵووسک** (هەورا.): سەلکەبزووت، سەرەبزووت، چوڵسک.

**چل وفل:** مرۆی نەوسن، چڵێس.

**چلۆک** (ئەردە.): چڵەپۆپەی داران.

**چلووک:** چڵووی گچکە، وورده چیلکە. (ئەردە.) مرۆی چڵکنی پیس و پەڵۆس.

**چلووکەر:** (باک.) چلۆبڕ، ئەوکەسەیە چڵووی کۆ دەکاتەوە.

**چلۆکۆک** (باک.): داروباری تێکچڕژاو.

**چلووگ:** چلووک.

**چڵومەل:** چەل و مەل.

**چلۆن:** (هەورا.) چۆن، کوو، چەنی، (باک.) چاڤا، چاوان، چاوانکی، چەوا، چەجوور، کتۆ، کتۆیی، کووسە، چەوا، چوویتم، کووسا، کووسان، چتۆ، چتۆنە، چاوا، بۆ پرسیاریەکاردەبرێ.

**چلۆنها:** هەڵکەوت.

**چلۆنی:** کتۆیی، کووی، چۆنی؟.

**چلۆنێتی:** چۆنێتی، (ڕۆژ.) پاودان، بار، دۆخ.

**چلی** (باک.): چڵێسی، نەوسنی، زۆر خۆری.

**چلیان** (ئەردە.): جێبەجێبوون، دروستبوونی کارێک، ئازاد کارەکەی بۆنا چلیێ: واتە بۆی درووست نابێ.

**چڵیان** (ئەردە.): ترووکانی چاو، ترووکیان.

**چلیان** (ئەردە.): گلیان، خلیسکان. (ئەردە.) لیویان، ڕێککەوتن، لووان، ڕاست هاتن. (ئەردە.) تووشهات، تووشهاتن.

**چلێچلی** (زا.): شەمشەمەکوێرە.

**چلێچیلی** (باک.): چەکچەکیلە.

**چڵێس:** زۆر خۆر، چاوچنۆک، نەوسن،زگن، زگبرسی، (باک.) چل، بۆ هەموو جوورە گیان لەبەرێکی بەکاردەبرێ. ـــ ی (باک.) چلی، زۆرخۆری، نەوسنی، زگنی.

**چلیک** (زا.): ئاسنی سەختی ساخ.

**چم** (باد.، باک.): سمی وولاخان و ئاژالان. (باک.) قوللەی کێویە، سەرتەپۆلکەی کێویە. (موک.) لەکاتی پرسیاردا بەکاردەبرێ، چیم؟ ئەمن چیم؟.

**چما** (موک.): بۆ، لۆ، بۆچی، لۆچی، لەبەرچی، داخوا، ئاخۆ، بۆ پرسیارە، ــ نایەتالامان: داخوا نایەتەلامان. (هەورا.) دەڵێی، ئەڵێی، ئێژی، چەما، چەمان، واگومان دەکرێ.

**چمان** (ئەردە.، موک.): چما، داخوا، ئاخۆ. (هەورا.) وەک، هەروەکوو. (باک.) خواربوونەوە، چەمان، چەمانەوە. (زا.) شکست.

**چمانی** (باک.): ڕاڤە(شرح) نەکراو، تێ نەگەیەنراو، ڕاڤەنەکردەنی.

**چیمەنزار** (باک.): چیمەن.

**چمبل** (باک.): دەسک و هەنگڵی دیزەو گۆزەیە.

**چمچ** (هەورا.): ئەژنۆ.

**چمچە**: چما.

**چمچم** (هەورا.): گێوەییێکە (کەلاش)، کەژێری چەرم بێ.

**چمچمە** (هەورا.): جوورە کەوشێکە لە پیستی خاوی ڕەشە وولاخان دروستدەکرێ، کالە یا ژێری چەرم بێ، چمچم. پێلاوێکە لەسیرمە دروستدەکرێ. (ئەردە.) چەمچە، کەوچک.

**چمک** (ڕۆژ.، کە.): داوێن و لچکی کەوایە، شاقەل. (باک.) ــ دان: بە ماشە یا بە دوو قامکان گرتن. (سلێما.) لچکی پشتێنە، گۆشەی کالاو ڕاپێخ و چتی تر.

**چمکە** (ئەردە.): چونکە، چونکی.

**چمکۆ** (باک.): چونکوو.

**چمکی** (باد.): چونکوو.

**چنار**: دارێکی شووش و گەلاپانە، سێ جوورە، ۱) چنار: لکی زۆر بلاو دەبێ و ئەگەر لە کۆلکەکەی بڕیتەوە وەکوو دووخی ڕاست هەڵدەچی، چنار وەکوو ماری هەموو ساڵێکی تێکوڵ (پەلک) ی فڕیدەدا لە گەڵ ئەسپیندار زۆرجیاوازن گەلای وەکوو پەنجەوایە زۆر لە هی ئەسپیندار گەورەترە، ۲) پەلک: وەچناری دەچێ بەلان وەکوو وی ڕاست و باش نابێ و پەلکی خڕترە، ۳) سوورە چنار: زۆر بڵندو ئەستووردەبێ.

**چنارە کەڵە**: گیایەکەی وەهی چنار دەچێ بە کوتراوی لە بالۆکە و قونێر و برینان دەنرێ: دەرگای دەکاتەوە.

**چنارکەڵە**: چنارکەڵە.

**چنارستان**: جنێک، کۆزەسپیندار.

**چنکە** (ئەردە.): چەنەگە.

**چناکەدان** (ئەردە.): چەنەدان و قسەزۆر کردن.

**چناکەشکیاگ** (ئەردە.): مەبەس لە مرۆڤی سازندەیە.

**چناگە** (جا.، ڕۆژ.): چەنەگە.

**چناگەدان** (ئەردە.): چەنەلێدان، چەنەوەری.

**چناگەشکیاگ** (ئەردە.): چەنەباز، چەنەوەر، هەڵیست وێژ.

**چناگەهەڵتەکانن**: چەنەگە تەکاندان.

**چناک** (باد.): کەمتەرخەم، شڕ، بێ سەروبەر، (باد.) شلیخە.

**چنانن** (باک.): پاراستن، خووەژێ ــ: خۆ لێپاراستن. چنین، بۆ گوڵ و میوەو ئیتر.

**چناوە** (لو.): چەنەگە، چەناگە.

**چنەو** (لو.): ئاوا، ئاناوا.

**چنە** (زێ.): قەرتاڵەی چکۆڵە.

**چنەویەرد** (هەورا.): بەخشین، لێبووردن.

**چنەچنکردن**: هەڵپەکردن، بۆ پەیداکردنی چت بە شێوەییێکی سووکی و ڕیسوایی.

**چنبۆڵە** (کۆ.): چەمۆڵە.

**چنجرووک**: چرنووک، چنچرووک.

**چنجک** (ڕۆژ.): چنکە گۆشت.

**چنجک** (ڕۆژ.): زەنگەتە ترێیەک. (فە.) چەقالە، دەنکە ڕەقەکەی بادام و قەیسی و ئیتر، ناوکی میوانە،(لو.) جینچک.

**چنچک** (هەو.): چنچکان.

**چنچک**: جنجک، قنجکی بامێ و میوەیە، قونچک. برێشکە.

**چنچکان**: (هەورا.) جیجکان، لەسەر ــ دانیشتن: هەڵتروشکان، وەبە ــ دان: لێژەنین.

**چنچکە سلێمانە** (هەورا.): باپشکێو.

**چنچن** (باک.): چەنەسووک، زۆر بڵێ، چەنەباز، بۆڵەبۆڵە، (باک.) پۆلپۆلە، گازندەی بێ سوود. ــ ی: چەنەسووکی، زۆر بڵێیی.

**چندک** (باک.): تەکان، ــ ا خووەدان: تەکان دانەخۆ.

**چنرانەوە**: ڤەچنین، پینەکردن.

**چنراو**: گۆزەوکری تر، کە چنرابێ، تنراو.

**چنک** (شن.): وورتکەنان.

**چنکچنک** (گەر.): دەرزۆزەکەر. وورتکەی نان.

**چنگ** (باک.): دەنگی زێـوو زێڕ و مسـو کانانە، چرنگە، زرنگە. (ئەردە.) چەماوەوە، کوم، گێڕ. مست، مشت، چەنگ، پڕبە ــ ی: پڕ بە مستێکی قووچاو پڕبە چەنگی، ــ لێدان: مشت لێدان. چنگوڕک، چنگر، پەنجەو نینۆکی باڵندان و گیاندارانی تر، چەنگاڵ، پەنجووڵە، چنگاڵ.

**چنگاڵ** (هەورا.): چەنگاڵ، چنگوڕک، ــ ی شێری: چەنگاڵی شێری و جانەوەر و باڵندانە. (هەورا.) قامکەوانەیە لە تەنەکە دروستدەکرێ بۆ سەپانان، کە لە کاتی دروێنەدا لە قامکی دەکەن. قولاپی ماسی گرتنێ و ئیتر، ئاسنێکی چنگدارە گۆشت و چتیتری پێدادەکرێ. ئاسنێکی پەلدارە لە تەڵەی دەخرێ یان سەتڵ و دۆلچە، کە کەوتنە ناو بیرەوە پێی دەردەهێنرێ.

**چنگاڵ و ڕۆن** (دەر.، ڕۆژ.): هەرمێشک، کوللێرەی گەرم لە ناو ڕۆن کوشێن بۆ خوواردنی.

**چنگانە**: جوورە چەنگاڵێکە هەنگوینی پێ لە کونـی بـەردی دەردەهێنرێ.

**چنگاووڵ** (ئەردە.): چەمۆڵە، پووچک، پووکاوول.

**چنگاوێز**: دەسەداینە، دەستەودامێن.

**چنگەپڕچێ** (هەورا.): چەنگەپڕە، شەڕکردنە بەچەنگ و دەست و پەل، بەپەلەپەل.

**چنگەپۆپان:** دەست بازی و شەڕە چنگ.

**چنگە پۆپانێ:** چنگە پۆپانێکردن.

**چنگەڕنێ:** چنگ لە زەویدا گیرکردن لەبەر نەخۆشی یا ئێش و ئۆفێکی زۆر، ڕنینەوەی دەغڵ و گژوگیا بە دەستی.

**چنگەکرە:** چنگە کرێ، چنکلە چزێ.

**چنگەکرێ:** سەرکەوتن بۆ شوێنێکی بەرز بەهۆی گیرکردنی چنگەوە.

**چنگەڵــە** (هــەورا.): فشـــەکلاۆنە، شـــووان خەڵەتێنـــە، شـــووان هەڵخەڵەتێنە.

**چنگە مریشکە:** پێ مریشکە، گیایەکە گەڵایەکانی وەکوو پێـی مریشـک پەرەداره.

**چنگیانکردنەوە:** دەرۆزەکردن.

**چنگر** (فە.): چنگوڕک، چەنگاڵ.

**چنگ قـز کردنـەوە:** دەست بـڵاو کردنـەوە لـەگـەڵ کووڕکردنـەوەی بـەهۆی ترس یا ئازارێکەوە.

**چنگکەوتن:** دەستکەوتن.

**چنگگرتن:** چڕنووک لێدان، ڕنین.

**چنگڵە** (هەورا.): زەمبیل، زەمبیلە، بەرچینە، لە شووڵ یان لە قامیش دروستەکرێ و گچکەیە، سەوەتە.

**چنگڵە چزێ:** چکڵەچزێ.

**چنکلەسەرە** (ئەردە.): سەرقژن، کژنەسەرە.

**چنگ مریەم:** بخووری کوردان.

**چنگنـە** (هـەو.): جـووره جاڵجاڵـوکەیـەکی زۆر گەورەیـە، شـێرپەنج، چنگـن. تیرەیـەکی کوردانـە. گیایـەکی گـەڵاووردی ڕیشـەداره لـە نـاو کشـتوکاڵدا دەڕوێـت و زیـانـدەرە یـان هاوینـان لـە کانگـاوانـدا دەڕوێ. (هـەورا.، زەن.، دەر.، هـەو.) پنـد، پنـت، لـە ڕەسـەنی قرنووییـە، زیندەوارێکـە بـە ناوبنی مـووانـدا دەچێتـە نێـو گۆشـتـەوە لـە بـەر چڵکـنی بـەدوورو درێژی و بەچارەیـەوە لـەبەرانبـەر پنـد نووسـراوە. کـەوەی، مـچ، مچـک، زیندەوارێکی شینکاری زۆر وورده بـەبن تووکی ئـاژاڵ و ئـێستردا دەڕواتـە نـاو گۆشـتـەوە لاوازی دەکـات، دەرمـانی کـوردەواری ئـەمەیـە: سەڵکی سیر بکوترێ و لـە بنـد دانـی ئاژاڵەکـە بسـووڕێتەوە پـاش یـەکدوو ڕۆژان هەمووی دەمرێت و هەڵدەوەرێت.

**چنگنەسەرە** (ئەردە.): چنگڵەسەرە، کژنەسەرە، قژن.

**چنگـنی** (بابا.): خێڵێکی کـوردە لـە کـەنار سلێمانی. چنگنـە، جـووره جاڵجاڵوکەیەکی زۆر گەورەیە.

**چنگوو** (باک.): کانی، مینایی.

**چنگوڕک:** چنجرووک، چـەنگوڕک، چنـگ، چڕنـووک، چنگاڵ، چـەنگ، ڕنووک. ـــ لـێدان: بە نینۆکان ڕنـین، چنگلێدان، سـەری نینۆکـە تیژەکـانی پشیلەو باڵندەو جانەوەرانە.

**چنۆ** (هەورا.): وەها، ئاوا.

**چنوور** (هەورا.): جووره گیایەکی بۆنخۆشـی کوێسـتانییە وەگـەسـکی هێنـدی، پەشمـەکی دەچێ و گوڵێشـی هەیـە گەڵایەکەشی وەهـی شـوویت دەچێ.

**چنۆک:** چاوچنۆک، چاوبرسی، نەوسن، (ڕۆژ.) جلفر.

**چنۆکی:** چاوبرسێتی، چاوچنۆکی، (ڕۆژ.) جڵفرپی.

**چنووندەر:** چەوەندەر.

**چنیای** (هەورا.): چنین، بۆ لۆکە و گۆرەوی و دەغڵ.

**چنیەی** (هەورا.): چنین.

**چنیک** (زا.، دهۆ.): تووکی لاجانگییە، کە لە نێوان چاوو گوێیاندایە.

**چنیک چنیک** (باد.): چتی ڕەنگاوڕەنگ.

**چنین:** چناندن، ڕاچاندن، داچناندن. ـــ ی گـوڵ و میـوەو ئیـتر: گـوڵ ومیـوە لێکردنەوە، کۆکردنەوە، دارنـین، ووتـە ـــ: قسـەچنین. بژارکردن، بژاردن، (ئەردە.) بژنین، هی برنج و ئیتر. دروونەوە، گۆرەوی ـــ: تـەنین، (بـاک.) هێڤـازتن، دروێنـەکردن. (ئـەردە.) بژاردنـی دانەوێڵـە. پەسـتاوتن، دروستکردن.

**چنینەوە:** ئەچناندن. گۆرەوی و بـەرەو مـافووره و تـەنراوانی تـری هەڵوەشـاو بـەکاردەبرێ بـۆ چنینـی شتی دیکـە. کۆکردنـەوەی دانەوێڵەی ڕژاو یابـەری داری هەڵوەریوو ئیتر.

**چنین بانیەک:** لـەسەریەکتری چنین.

**چنین لای یەک:** لـەتەنیشت یەکترییەوە چنین.

**چۆ** (باک.): چێو، داردەست، گۆچان. (زەن.، ڕۆژ.) داری تەڕووشک. (باک.) داری فەرمان ویاسا. (هەورا.) لەوێ. دەنگێکە کـەر و ئێسـتری پێ لێدەخورێ.

**چۆبەچۆ** (ئەردە.): بەرانبەر، وەک یەک.

**چۆپ** (ئەردە.): درۆ. چەپ، چۆپە.

**چۆپان** (زەن.، لو.): شوان. (ڕەوا.) چریە، چۆپە، (باک.) دلۆپە.

**چۆپـە:** چەپـە، کەسێکە ڕاسـتە نـەبێ و هـەموو چتێکی بـە نووسینەوە بـە دەستی چەپەی بکات.

**چۆبە** (پژ.): چەپ، چەپلەر، چەپرا، چەپە، چۆپان، لای چۆپە.

**چۆپەیی:** (جا.) چەپی، جووره هەڵپەڕینێکە.

**چۆپچۆپـان:** چاخێکـە لـە بـەهاراندا گیا هێنـدە بـەرز ببێتـەوە، کـە شـووان ئێواری دارەکەی باوێژێتە ناو گژوگیایان سبەینێ بۆی نە دۆزرێتەوە.

**چۆپچۆپێن:** چۆپچۆپان.

**چۆپر** (زا.): کوویر.

**چۆپکردنەوە:** بادانەوە، وەرگەڕانەوە.

**چۆپلمە** (باک.): نەخۆشییێکی وولاخانە لە سینگییاندا سەر هەڵدەدات.

**چۆپـی:** (ئـەردە.) چووپـی، (جـا.، هـەورا.) چۆپـەیی، چـەپی، جـووره هەڵپەڕینێکە جارجارە بەلای چەپیدا دەخولێنەوە، سەرچۆپی.

**چۆپی کێش:** کەسێکە سەر چۆپی بکێشێ.

**چۆپیک** (باد.): مرژی کەمهۆش.

**چۆت** (باک.): پارچەیەکی گوشادە بەسەر جلکی خۆیانی داوەردەگرن، بە گچکەی وی دەڵێن (چۆتکە) لە لۆکەی دروستەکرێ.

**چۆترم:** پشوودان.

**چۆتورمە** (ئەردە.): پشێوی.

**چۆتلمە** (باک.): چوتل، ژەهر، چەهری مار، لە کاتی وەلاّم دا بە توورەیی بە کاردەبرێ.

**چۆجەڵە:** ڕێزە قولّفەییێکە بە تەختە دەوارەوە لە کاتی هەڵدانیدا تێکدەخرێن بۆ پێکەوە نووسانیان. دارێکی باریکی ڕەشە وولاّخی پێ چەڵە دەکرێت.

چەچ

**چەچ** (باک.): کەر، گوێدرێژ، بە زاراوەی منداڵان.

**چۆچە** (ڕۆژ.، کۆ.): پارچە زێڕێکی سێ لزگەییە ژنان بە سەرو کلاّوی خۆیانی دادەگرن و بە لاجانگیاندا شۆڕ دەبێتەوە بەسێ لزگەکان دەڵێن ـــ، پرپرە.

**چۆچەک:** جوورە خشڵێکی ژنانەی پانی پرپرە دارە بە لای ڕاست و چەپی سەریاندا شۆڕدەبێتەوە.

**چۆچە:** جوورە خشڵێکی ئافرەتانە: گولّێکی خڕە و پرپرەشی هەیە بە ئاڵقە لەلای گوێی لە کلاّوەکەی دەخرێ.

**چۆچک** (باک.): چەماوەوەیی دار و گۆچان و ئیتر.

**چۆچکردن** (هەو.): تۆتێکردن، بەزاراوەی منداڵان دانیشتنە.

**چۆچڵە** (ئەردە.): قیتکە، چیچڵە، بەڵوکە.

چۆچک

**چۆخ** (زێ.): پەستەک. (باد.) چۆغە. ووت، جوورە پارچەییێکی خوری نرخدارو باشە.

**چۆخە:** (هەورا.) چۆغە، چۆخێ، (هەر.) بەرگووز، چۆخەڵ، شاپک، شەپک.

**چۆخەڵ** (سور.): چۆغە.

**چۆخ ڕەشا:** ئیلێکی کوردە، خێڵ و هۆزێکی کوردە.

**چۆخسۆرا:** ئیلێکی کوردانە لە کۆچەری میرانە، ڕەنگە لە ڕۆژاوای ماردینێ بن.

**چۆخێ** (هەورا.): چۆغە.

**چۆدار** (لو.، کەل.): چێودار. ـــ ی: چێوداری.

**چۆدەر:** چۆدان، چۆداس، قەلاّس.

**چۆڕ:** چڕ، نەخت، کەم، چک، قوم، تنۆک، تنۆکە؛ ـــ یێک ئاو: کەمێک ئاوە تەنها بۆ ئاوە، ـــ ی لێ بڕی: تنۆکەی لێبڕی.

**چۆڕان:** تکان، چکان.

**چۆڕانەوە:** تکانەوە، داچۆڕان، هەڵچۆڕان، چکانەوە.

**چۆڕاندن:** تکاندن، چکاندن.

**چۆڕاندنەوە:** چکاندنەوە، تکاندنەوە، داچۆڕاندنەوە.

**چۆڕاوەوە:** تکاوەوە، چکاوەوە.

**چۆڕاوکە:** هاتنە خووارەوەی بارانە لە پلووسک و گوێسەبانە.

**چۆڕاوگە:** بەرپلووسک، شۆڕاوگە، باراناوێکە بە گوێسووانەدا بێتە خووارەوە، جێگای ڕژانی ئاو.

**چۆڕە:** دەنگی چۆڕانەوەی ئاوە، شۆڕە.

**چۆڕەبڕە:** ووشک بوونی ئاو لەشووێنێک.

**چۆڕەبڕکردن:** ووشک کردنی ئاو لە شووێنێکدا.

**چۆڕەچۆڕ:** تکەتک، چۆڕچۆڕە، چکەچک، شۆڕەشۆڕە.

**چۆڕبڕ:** ووشک و چکبوونی ئاو لە شووێنێک، کە چۆڕی تێدا نەمێنێ، ووشککردنی ئاو لە شووێنێک.

**چۆرت:** شلّەژاو، شێواو. ـــ پارەبوون: تێکچوون، شێوان، شلّەژان. (باک.) گۆیکە و گۆی سەرمەمکانە، سەخت، دژوار. (ئەردە.) پینەکە، وەنەوز، چورت، خەوەنوچکە، چووارچێوەیەکە چەند تەلێکی تێدا ڕایەڵ و هەڵکێشرابێ و چەند گرمووکە دارێکی تێدایە ئەژماری پێدەکرێ، چورتکە.

**چۆرتان** (باک.): جوورە پەنیرێکە. کەشک.

**چۆرتدان:** وەنەوزوان.

**چۆرتشکان** (موک.): بارتێکچوون و داچڵەکینی تریاک کێشانە بە تەقەیەکی.

**چۆرتک:** کەمۆکەیەک ئاو.*

**چۆرتکە:** چۆرتی دوکانداران، مرازێکە، ئەژماری پێ دەکرێ.*

**چۆڕچۆڕ:** دلّۆپ دلّۆپ، تنۆک تنۆک.*

**چۆڕس** (باک.): زمان ناخۆش، زمان پیس.

**چۆڕک:** جۆڕک، توورەکە، کوندە؛ ـــ ە میزێکی کرد: توورەکە میزێکی کرد.

**چۆڕکە:** جێگایەکە ئاوی لێ بچۆڕێتەوە.

**چۆڕنوسقاو:** ترنووسقاو، چەورییێکی کەمە بکەوێتە سەر ئاوی شۆرباو.

**چۆڕیان:** چۆڕانەوە، چۆڕیانەوە.

**چۆڕیانەوە:** چۆڕانەوە.

**چۆڕین:** گیایەکی کێوییە و گەلاّی سێ سووە وەکوو پیوازی بلّند دەبێ بە تەڕی و ووشکی لەگەڵ هەموو جوورە چێشتێکی دەخورێ.

**چۆش:** چۆئش، ووش، ووئش، هۆش، هۆئش، وەش، ووشەییێکە بۆ ڕاوەستاندنی گوێدرێژان بەکار دەبرێت.

**چۆغان** (هەو.، فە.): گیایەکە کۆلکەکەی بە کوتراوی وەکوو ئەسپۆن کەل و پەلی چڵکنی پێدەشۆرێ، کە بە لفکە لەشی خورشتداریشی پێ بشۆرێ زۆر بەسوودە.

**چۆغە:** چۆخە، جوورە تەنراوێکی خوری خاوداری جووانی هەمەڕەنگەیی نرخدارە. چۆخەیەکە لەگەڵ ڕانکی لەبەردەکرێ.

**چۆغەبازەڵە:** بزڵە، کوودەڵە بەرازی شیرخۆرە، بزەڵە.

**چۆغەڕەش:** بریتییە لە چێشتی ماشی ڕەش.

**چۆغەڵ:** ئەوەی لەگەڵ ڕانک لەبەر دەکرێت، چۆغە.

**چۆڤ** (باک.): چۆ، داردەست.

**چۆڤانن:** بەتاڵکردن. قووچاندن.

**چۆق:** نەفەسێکە، کە لە قەلیانی دەدرێ، قوم.

**چۆقان:** لەرزین (لەسەرمان).

**چۆقاندن:** لەرزاندن (لەسەرمان) یالە ترسان، هەڵقرچاندن لە تاوە و چتیتردا.

**چۆقانن:** چۆقاندن.

**چۆقە**: چیرەی ددان، دەنگی ویککەوتنی ددانانە لەکاتی لەرز یا ترس یا سەرمایەدا، کزە، سۆز، سۆزش.

**چۆقــەچۆق**: چیرەچیری ددان، ددانــە چیرە، شەقەشــەق، چرقــەچرق، چەقوچۆق، لە سەرمان یا لە ترسان ددان لێکدان و لەرزین.

**چۆقدان** (کە.): قوو تدان.

**چۆقل** (باک.): نەرمەی بەلەکێیە، لوولاک، لاق.

**چۆقیان**: چۆقان.

**چۆقین**: لەرزین لەسەرمان.

**چۆک**: ئەژنۆ، زەنکوڵ، چۆنگ، چیک، ووژنگ، (فە.) زرانی، زەرانی. ـــ دان، لە سەر چۆکان ڕۆیشتن، لەسەر تووتکا ڕوونیشتن، چۆکـانی، قەلەقۆزکێن. کێر، کێروولْ، قامیش.

**چۆکان** (باک.): چەوگان.

**چۆکانی** (باک.): لەسەر چۆکان ڕۆنیشتن یا دانیشتن لەسەر ئەژنۆیەک و ئەویتر قیت کردنەوە.

**چۆکدادان**: چۆکدان، لە سەرئەژنۆیان ڕۆنیشتن.

**چۆکــدار** (بـاک.، مەگـە.): پاسـەوان، نۆبـەتچی، کێشـکچی. ـــ ی: پاسەوانی، نۆبەتچێتی، کێشکچێتی.

**چۆکدان**:مەبەس لە خواردنی چتێکییە بە تەواوی و نەهێشتنی. لەسـەر ئەژنۆیان دانیشتن.

**چۆکدانەسەر**: تەپدانەسەر چتێک.

**چۆکهەڵدان**: چینچکان، ئەژنۆیەک بڵندکردن. قینچکان.

**چۆکهەڵنان**: دانیشتن لە سەر قاچێک و هەڵنانی قاچەکەی تر.

**چۆگان** (ڕەوا.): چەوگان، گالۆک.

**چۆگە** (هەورا.): لەوێ.

**چۆل**: بیابـان، چـۆڵ، دەرەوە، بیـاوان، دژی ئاوەدانییـە. بـەتاڵ، خـاڵی، نائاوەدان، والاَ، ڤالاَ: واژی ئاوەدان. ، مالّی ـــ، دێی چۆڵ.

**چۆڵ**: چۆل، بیابان، دەشت.

**چۆلانگ** (گەر.، خۆ.): چۆلاکی بەری داران لێکردنەوە.

**چۆلاوە**: چـەند دارێکـی دووپـەلن دادەچـەقێنرێن و ڕایـەڵیان لەسـەر هەڵدەکرێ.

**چۆلای بوو** (ئەردە.): چۆن بوو، چەجوور بوو.

**چۆلە** (باک.): شۆخی.

**چۆلـەبڕ**: گۆشـەگیر، دوورە پـەرێز، کـەنارەگیر، گۆشـەگر، بێرێگـە، چۆڵگەر،کەسێکە بە چۆل و بیاباناندا بڕوات.

**چۆلەپێچەن**: دارێکە بە نێوەڕاستی دەرکی تەویلە و هـۆز و هۆڵانیدا ڕایەڵ دەکەن تا ڕەشەووڵاخ، ووڵاخ وئاژاڵانی پێدا نەیەتە دەرێ.

**چۆلـەچرا**: چۆلـە چـراوێ، (هـەورا.) چۆلـەچراو، شـەوچرا، چـراووک، چراوکە، (باک.) بسبسۆک، سوولـە چـرا، چوکلـەچرا. دارێکـی تـەڕە بەقـەد کـەزێکی سـەرەکەی دەکوترێ تـا شـێ دەبێتـەوە بـە ووشکی لـە تـاریکیدا دادەگیرسێنرێ لە باتی چرا.

**چۆلەچراو**: چۆلەچرا.*

**چۆلەچوون** (باک.): چۆلـەبڕ، گۆشەگیر، کەنارە گیر، گۆشەنشین.

**چۆلەزمە** (هەورا.): تێوەژاندن.

**چۆلەکە**: کێژرولـە، کێشـکە، کووێشـکە، (بـاک.) بـەیتاک، بێتـک، (هەورا.) ملی چلّێ، مـری چلّێ، کێشوولە، کووێژیلە، (ڕەوا.) کێژکە، (باد.) چووچکە، چیچکا، (فـە.) مـەلوچک، بـە هـەموو بـاڵندەیێکی گچکەش دەڵێن. (شـا.) مرازێکی جۆلاییـە، دارێکـە بەقـەد مەچەکێکی دوو کوونـی تێدایـە هـەر کونـەی چـەرخێکی تێـبراوە (گـورد) ی جۆلایـی لەسەر هاتوچۆدەکات لەکاتی کار کردنێدا.

**چۆلەکەبکوژ**: مـەبـەس لـە مرۆڤـە؛ ـــ ی تێدانیـە واتـە هیـچ کەسـێکی تێدانیە.

**چۆلـەکی** (باک.): مێگەلـە مەرێکە کۆ دەکرێتـەوە بۆ ناردنـە لـەوەڕ و چوراگا.

**چۆلّـمـە** (مـوک.): ئێسـکی شـانییە، کـە بـەلای سـینگیدا لەسـەرەوەی ئێسکی بڕبڕەی سینگی قایم دەکرێ، ئێسکی چۆڵە مێشکێنەیە.

**چۆلّەمە** (شار.): بەبەغە، قوولایی خووار قوڕگ.

**چۆلّەمێ**: چۆلّمە.

**چۆلّەمێشـکێنە**: قومـاری چۆلّمەشـکاندن، کـە هـەرچی لـەبیری بچـێ دەیدۆڕێنێ، دەبێ هەرچیی هاوگرێوی وەرگرت بڵێ لەبیرمە.*

**چۆلّبڕ** (باک.): چۆلّگەڕ، چۆلگەرد.

**چۆلّبڕی**: چۆلگەردی، گەریدەیی.

**چۆلّبوون**: بەتاڵبوون، بەربوونی باخ و بێستان.

**چۆلّپەرس**: چۆلپـەرست.

**چۆلّپەرست**: کەسێکە هـەر لـە چۆڵێدا بـژی. ـــ ی: ژیانێکـە لـە چـۆل و بیاباناندا بەسەر ببرێ.

**چۆلچڕ** (ئەردە.): هۆرەیەکە هەر لە بیابانێدا دەکرێ.

**چۆلّچرا**: ئاوازەیێکی تایبەتی بیابانێیە.

**چۆلخە** (باک.): کەسێکە بە برینگی خوری ئاژالان ببڕێتەوە.

**چۆلک** (باک.): لیسی سێبەر. (زا.) ئاودەستخانە.

**چۆلکردن**: بەتاڵکردنی خانوو یا دووکان یان شوێنێکی تر.

**چۆلّـگە**: دەشت و بیابان.

**چۆلّگـەرد**: چۆلّگـەڕ، چۆلّـبڕ، کۆچـەر. ـــ ی: کۆچـەری، چۆلّـبڕی، چۆلّگەڕی.

**چۆلگەڕی**: گەریدەی دەشت و بیابان.

**چۆل و بیابان**: شوێنێک هیچ کەس یا کشت و کاڵی تێدانەبێ.

**چۆلّوسک** (ئەردە.): چلّۆسک.

**چۆلّ و هۆڵ**: شوێنێکە، کە لە هەموو گیان لەبەرێک بەتاڵ بێ، (ئەردە.) خوت وخووالا.

**چۆلی**: چۆلّی.

**چۆلّی**: گەلامێویا گـەلای کـاهوو، کەبـە لێکدانـی دوودەستان کون دەکرێ وەکوو دەمانچەی تەقەی دێ. شوێنێکە کەسی تێدانەبێت.

**چۆلیکانێ** (هەورا.): جوورە گەمەیەکە.

**چۆم:** (بابا. ، شا. ، کە. ، سنە.) چەم، (هەو. ، رەوا.) رووبار، (هەورا.) دەرە، (دەر.) گەلاڵ، (هەر.) بەست، (باک.) جۆبار، جووف، روو، رۆ، رۆبار، رۆخانە، رووخانە.

**چۆماتر** (دزە.): چۆماخ، کوتەک، داردەستێکی ئەستوورە.

**چۆماخ:** تێلا، لیس، چوخماخ.

**چۆمانەوە** (رەوا.): چەمانەوە، خواربوونەوە، داهاتنەوە، کووربوونەوە، کۆم بوونەوە.

**چۆماندن:** چەماندن، خوارکردن، کوورکردن.

**چۆماندنەوە:** خوارکردنەوە، کوورکردنەوە، کۆمکردنەوە.

**چۆماو:** چەماو، شوێنێکە چۆم و ئاوی زۆر تێدابێ.

**چۆمەرا:** خێڵێکی کوردە لە نێو(هەڤیرکان) دایە لە نزیک قامیشلوویە.

**چۆمەلان:** جێگایەکە چۆمی زۆر بێ.

**چۆمی:** چەم.

**چۆمیلکە** (باک.): کەرە مێو، داڵەلووک.

**چۆن:** چلۆن، کتۆ، کتۆیی، کوو، چەوا، چاوا، چاق، چتۆنە، چاڤا، چەنی (بۆ پرسیارە).

**چۆنە** (باک.): یەکدەست.

**چۆنەر** (ئەردە.): چەوەندەر.

**چۆنەرقەند:** چەوەندەری قەندی.

**چۆنەربریانی:** چەوەندەری بریانی.

**چۆنەرین:** چێشتی چەوەندەر بە ترشی.

**چۆنچۆن:** ئای ئای، لەکاتی پرسیار، یا بە سەر رۆیشتن یا هەتکدا بەکاردەبرێ.

**چۆندەری** (هەورا.): چەوەندەر.

**چۆنگ** (باک.): چۆک.

**چۆنی:** چلۆنی، چلۆنێتی، کوویی، کووی؟ لەچ بارێکی دای؟.

**چۆنێتی:** دۆخ، بار، (رۆژ.) پاودان، چلۆنێتی.

**چۆو** (ئەردە.): داردەست، چێو.

**چۆهچۆه:** چۆچۆ، ووشەیێکە لە کاتی ئالیکدانێدا گوێدرێژی پێبانگ دەکرێ.

**چۆتورمە** (ئەردە.): تەوەرە، رووشە، هەنگامە، کارەسات.

**چوتێم** (باد.): چلۆن، چۆن.

**چۆچ** (باک.): تۆت، تۆتی، بۆ دانیشتنی منداڵان بە کاردەبرێ.

**چەختی:** چەقەسوو، بێشەرم.

**چوخک** (باک.): چۆغە.

**چوخم:** تاقێکی گەورەیە، کە بەسەر کۆلانێکی داهاتبێ و ژوورێکیشی لەسەر دروستکرابێ و لە ژێرەوە کۆلان و خەڵقی بە ژێردا بروات. چوخمە.

**چوخماخ:** چۆخ، تێلا، لیس.

**چوخمە:** چوخم.

**چوخور** (ئەردە.): چەم، رووبار، چوغورد، بێش.

**چوخورد:** چەوغورد، چەم و دۆڵی چڕ، بێشە.

**چوڕ** (ئەردە.): شەق، ـــ(باک.): رفاندن و تالانکردنە، جوورە ئاژاڵێکی خراپە. (ئەردە.) سپێتی، رەنگی سپی، سپی پاکی بێ پەڵە وەکوو رەنگی شیری.

**چووڕە:** جوڕە. *

**چورت:** خانووچکە، چۆرتی ئەژماردنێ. (ئەردە.) چۆرت، وەنەوزەکوتێ.

**چورتاندن:** (ئەردە.) پینەکی، ترووکاندنی پەلە پیتکەی تفەنگ و دەمانچە.

**چورتانن** (ئەردە.): ترازاندن، چورتاندن.

**چورتە:** جووڵە؛ ـــ ی ناکات: جووڵەی ناکات.

**چورتک** (ئەردە.): چوڕ.

**چورتکە:** چۆرتی حیسابی.

**چورتم:** سەخڵەتی و دەردەسەری، کارەسات، نووچبردنی کەسێک.

**چورتم بردن:** نووچبردن بەدەم دەرد و خەفەتەوە.

**چورتمدان:** چورتمبردن.

**چورتیان** (ئەردە.): ترازان.

**چورچ** (هەو.): چرچ.

**چورچەمەن** (هەو. ، رەوا.): مرۆی چرچ، سیس.

**چورچور:** جوورە مرازێکی کۆنی شایلۆ غانێ بووە، بە گچکەکەیان کوتووە چورچورکە.

**چورخ** (باد.): چەرخی چەقۆ تیژکردنێ.

**چوردانەوە** (ئەردە.): وەلامدانەوە.

**چورک** (باک.): چیرەی ددانانە؛ بارام ددانێ خووە لفەرهاد دچورکینێ.

**چورکردن** (ئەردە.): دەست لێگیرکردن، دەست لێبەند کردن، رنەکردن.

**چورنوسقاو:** ترنوسقاو.

**چوروو** (ئەردە.): چرووک، هیچ و پووچ.

**چوریان:** چۆران، چۆڕانەوە.

**چور** (باک.): قۆڕەقۆڕی زگیبەلەبرسان.

**چوریسک** (باک.): تروسکەی ئاوری.

**چوز:** خەڵفێکی تازەیە لە داری موتر بەکراو لە شوێنی موتربەکەدا رووابێ، لق وپۆپی تازەی داران.

**چوست:** شاتر، تەتەر، توند، چالاک، توندوتۆڵ، گورج، ووریا، چابوک، تەردەست، خێرا، بەپەلە. (باک.) بەتالووکە، بساف. (زەن.) تەلان.

**چوستەک:** ئێمەنی، جوورە پێلاوێکی سوولە.

**چوستی:** توندوتۆڵی، چالاکی، تەتەری.

**چوستێتی:** تەردەستێتی.

**چوشتر:** چووێشتیر، چوشتیر، چتیر، رەشانگی نێر یا مێ، کە تەمەنی لە نێوانی ساڵێکی تا دووساڵبێ.

**چوشتیر:** چووێشتیر.

**چوغورد:** چوخورد، چەم، بێشە، چەم و دۆڵی چڕ.

**چوقلی** (باک.): گوڵی سەر چڵی دارانە، سەرچڵ، لک، لو.

**چوکڵە:** پارچە دار یا چیلکەیەکی گچکەیە، چیلکە، ووردەدار، چیکڵە. نووکێکی بەرزی تیژە بۆ هێندێ پیت دەنووسرێ وەکوو (بێ، تێ)، کەبەدەم تیپی ترەوە بنووسرێن تەماکۆ، دەمار.

**چوکڵەخیگە:** پشکی هیزە ومەشکە، پژک، پشک.

**چوکڵەشکێن** (ئەردە.): برێتییە، لە چەڵتووک خستنە ناو کاری مرۆڤانەوە.

**چۆکڵەشکێنی:** پشێوی.

**چوکڵەقولاپ:** قولاپی ماسی گرتنێ.

چوکڵەقولاپ

**چوممە** (زا.): هیچ.

**چون** (هەورا.): وەک، وەکوو، وەکی ویّنەی.

**چوندە** (شەبە.): نێرە.

**چونکە:** چونکوو، چونکی.

**چونکوو:** چونکە، لەو، لەورا، پاشکۆ، (باک.) چکۆ، چمکۆ، چونکی، لێ، لەوما، مافر.

**چونکی:** چونکوو.

**چونگە** (فە.): چینە. ـــ کردن: چینەکردنی پەڕەووران.

**چوننە** (باک.): هیچ، پووچ.

**چون یەک:** وەک یەک.

**چوو:** بڕو بێ هەست، دەستم چووە: دەستم لەسەرمان سڕ بووە. (ئەردە.) داری ووشک، چێو. (موک.) گرێی چووەکەی قامکی دەست و پێیانە. (باک.) هیچ، هیچکام. (موک.) ڕۆیشت، (هەورا.) لووا، بۆ تاکە کەسێکی نەدیو بەکاردەبرێ. (موک.) گووێزنک، قاپ، دوو ئێسکە دەرپەڕیوەکانی ئەم لاو ئەولای قولاپەیە، جگ، میچ. گە: لە ـــ چوون: لەگەچوون (موک.) لە شێوەی شێوازەوە لە جیاتی (کیر) بەکاردەبرێ، نە، نەء، نا، نەخێر.

**چوو ئاوسان:** کیر هەڵامسان.

**چووا** (ژەنگا.): چیا، کێو.

**چووار:** چار، چهار، ٤، لە نێوانی ژمارە ٣ و ٥ یدایە.

**چوواران:** تەنها چووار.

**چووار ئاوێنە:** چەشنە زرێیەکی شەڕێیە لەکاتی جەنگێدا لەبەردەکرێ، چووار تەختە ئاسنی پێوەیە دەکەونە پێش و پاش و هەر دووک لای ئەوکەسەی لە بەری دەکات.

**چووار ئایینە** (ئەردە.): چووارئاوێنە.

**چووارە** (ئەردە.): چووارناڵە.

**چووارەم:** چارەم، چارهەم.

**چووارەمین:** چارەمین، چارهەمین.

**چوواربا:** بای سەبا، بای دەبوو، بای باکوور، بای باشوور.

**چوواربەن** (باک.): کورسی.

**چووابۆر:** چابۆر. (" ").

**چوواربێستان:** چاربێستان، بێستانێکە شووتی و خەیار و ترێزووی تێدا دەچێنرێ.

چوواربەن

**چووارپا:** چووارپێ، چارپا، چاروا، ماڵات.

**چووارپاچکە** (ئەردە.): چارپایە.

چوارپاچکە

**چووارپالوو:** چتی ئەستووری چووار گۆشەی ڕێک، چوواربەند.

**چووارپایە:** چارپایە.

**چووارپەل:** چارلەپک، هەردووک دەست و هەردووک لاق؛ بە ـــ ان ڕۆیشتن: پەلکین، بچار لەپکێ چوون.

**چووارپەل قەوی:** برێتییە لە گیانداری قەڵەوی پتەو.

**چووارپووڵەکە:** چووارپارچە چەرمی قەبزە نوشتەییە بۆ قایمی لەڕاست و چەپی کەوش دەدرێ لەئاستی جەمسەرەکانی.

**چووارپێ:** چووارپا، چارپا، خاوەندی چووار پێیان، چاروا، وولاخ، چارپێ، گیاندارێکە بە چووار پێیان بڕوات.

**چووارپینە:** چارپینەیە لەسەر پەنجەو پانیەی، کەوشی دەدرێ. ناپایەدار، بێفریشک.

**چووارتاقی:** گۆڕستان. هەیوان.

**چووار چابوخ:** چووارچاک، چووار پارچەی گچکەیە دەکەوێتە بن باخەڵی کەواوە.

**چووارچاک:** ـــ بەلاداکردن، داوێنهەڵکردن. هەڵدڕاوی، چووار چمکی، ئەملاو لایی کەوا.

**چووارچاو:** مەبەس لە پیاوێکییە، کە دووژنی هەبێ.

**چووارچاوبوون:** مەبەس لەسەر لێشێوانە.

**چووارچاوکردن:** مەبەس لە سەر لێشێواندنە.

**چووارچەقەل** (ئەردە.): چووار چنگۆڵە، چووار پەل، چووار دەست و پێ.

**چووار چمک** (باد.، ڕۆژ.): چووارگۆشە، چووارچاک.

**چووار چنگۆڵە:** ڕۆیشتن لە سەر چووار چنگان و یان بە چووار چنگان بە سەر چتێکی هەڵگەڕان.

**چووارچوار:** چارچار.

**چووارچێوە:** چارچم، کیرەشک، (هەورا.) چارچێوە، پەرواز، دارێکی چووار پارچە و چووار سووچە دەرگا و پەنجەرە وچتی تری تێدەخرێ و ئەو لەناو دیواردەخرێ، (باک.) دۆربەند.

**چووار خاڵکێشان:** ڕەشکردنی ناوچاوان و ڕووی یەکێکی بۆ ڕیسواکردنی.

**چووارخرت:** بزن و مەڕی چووار ساڵانەیە. (ئەردە.) مرۆی تێکسرماو و قەڵەوە.

**چووار خشتەک:** چووار پارچەی گچکەیە لە کەوا، کە هەردوویان بکەوێتە بندەستێک.

**چووارخشتەکی:** چووارلک، چارین، چووارنیوە هەڵبەستە، کە دووایییە کانی یەکەم و دوەم و چووارەمیان وەکوو یەکترین.

**چوواردارە:** دارتەرم، تابووت. (ڕۆژ.) خانووێکە لە سەر چووار کۆڵەکان ڕاوەستابێ.

**چوواردانگ:** چووارپەش لەشەش بەشان. برنجێکی کوتراوی ووردەیە لە ناوەندی پلاوی و خاکەرە.

**چوواردانگی:** چوواردانگ.

**چوواردە** (هەورا.): چاردە، (٢) جاران (٧) دەکاتەچاردە.

**چوواردەخانەی ڕەمل:** چاردەخانە لەسەر قاقەز دەکێشرێ ڕەملی پێدەگیرێتەوە.

**چوواردەڕێیان:** شوێنێکە زۆری ڕێگا لێ بببێتەوە.

**چوواردەستەکی:** هەڵگرتنی چتێکی بە چوواردەستان.

**چوواردەم:** چتێکە بەندیواری بە ژمارە چوواردە دابێ.

**چوواردەمین:** چتێکە لە پایەی چاردەمیندابێ.

**چوواردەورە:** هاویردۆر، دۆرمادۆر، چووارمیدۆر، چاردەور، چووارکەنار، چارکەنار.

**چوواردەهەم:** چوواردەم.

**چوواردەهەمین:** چوواردەمین.

**چووار دیوار:** خانووبەرەی تەواو بەسوور و پشتەوە.

**چووارڕایان (هەورا.):** چووارڕێیان.

**چووارڕووکن:** چوواردیوار، چووارلا.

**چووارڕێگایان:** چووار ڕێیان.

**چووار ڕێیان:** خاچەڕێ، چار ڕێیان، چووار ڕێگان، جێگایەکە چووار ڕێگەی تێدا ڕێک بکەوێ.

**چووارزربە:** چووارقەمچ.

**چووار سرشت:** چووار سووروشت.

**چووارسوو:** چووار سرشتەکان، چووارگوزەر، تاقێکە چووارگوزەری لێ جوێ بێتەوە.

**چووارسووچ:** چووار، چووار قولینچک، چووارگۆشە.

**چووارسوروشت:** چووارچەتن گۆیا: بناغەی دروست بوونی هەموو چتێکی وەکوو، (با، ئاو، خاک و ئاوور) بن.

**چووارشانە:** مرۆی پان و پۆڕ و بالاَبەرز و چارشانەی دارێژراو.

**چووارشەش:** چارشەش.

**چووارشەم:** چووارشەمە، چووارشەمۆ، چارشەمە، چووارشەموو، چارشەمب.

**چووارشەمە:** ڕۆژێکە لە نێوانی سێشەمە وپێنج شەمەدا.

**چووارشەمەسووران:** چووارشەمە سوورە.

**چووارشەمەسوورە:** چووارشەمە سووران.

**چووارشەمۆ:** چووارشەمە.

**چووارقاپ:** چارقاپ، زەندەشۆڕ، جوورە سەگێکی وایە زەندی لای پاشەوەی هەر چووار پەلەکانی دەکەوێتە سەرزەوی.

**چووارقەد:** چتێکە چووار جاران قەدکرابێ. — کردن: نووشتاندنەوەی چتێک چووار جاران.

**چووار قەمچ (ئەردە.):** کەسێکە، کە مووی ڕیش و سمێل و برۆ و برژانگی کرابێ.

**چووار قەمچکردن:** تراشینی مووی ڕیش و سمێل و برۆ و برژانگ.

**چووار قوڵفی:** چارگووشی (دیزە یا گوڵدان)، کە چووار قوڵفی هەبێ.

**چووارکەنار:** چارمەدۆر، دۆرمەدۆر.

**چووارگا (هەورا.):** هەوایەکی گۆرانی کۆنە.

**چووارگوزەر:** چووارسوو.

**چووارگۆشە:** چووارکەنار، چووارنیچک، چووارسووچ، چووارلک، چووارقولینچک، چووارچمک، چتێکە پانی و درێژی بەقەد یەکتری بن.

**چووارگۆشەیی:** چووارکەناری.

**چووارلا:** چووارگۆشە. هەموولایەک، پێشەوپاش و ڕاست و چەپی هەموو چتێک، دووباد، چووارلانە.

**چووارلایی:** چووارقەدی.*

**چووارلک:** چارین، چووارخشتەکی.

**چووارلوو:** چووالوو.

**چووارمەشقان:** چووارمەشقی، چووارزرانی.

**چووارمەشقێ:** چووارمێرەکی، چارتیکانی، چووارمێردەکی، جوورە دانیشتنێکە بە تێکپەڕاندنی هەردوولاقان بە نووشتاوەوەیی.

**چووارمێخە:** چووارسینگی داکوتراوە بەزەویدا بۆئەوەی، کە چووار پەلی یەکێکی پێوە ببەسترێتەوە.

**چووارمێخەکێشانەوە:** بەزەوی دادانی مرۆڤ لەسەر گازی پشتێ و بۆ سزادان چووار پەلی بە چووار مێخی داکوتراوەوە ببەسترێتەوە.

**چووارمێردەکی:** چووارمێرەکی، چووارمەشقی، چارتیکانی، چارمێرکی، جوورە دانیشتنێکە.

**چووارناڵە:** بە چووارناڵە غارپێدان، بەتاو غاردانی ووڵاخی یەکسمە، بەتاو، بەپڕتاوی غاردان، (باک.) باگار.

**چووارناڵەیی:** چارگاڤی، بە توندی و تاو غاردانی ئەسپە.

**چووارنان:** یەکێکە لە گەمەی قەڵەمندارێدا چینەکەی بەرانبەری خۆی بەزاندبێ و تێی خستبێ.

**چووارهەم:** چوارەم.

**چووارهەمین:** چوارەمین.

**چووارهەنگڵ:** چتێکە وەکوو خێگە و مەشکە وئیتر چووار هەنگڵی هەبێ.

**چووارهەنگوڵ (ئەردە.):** چووارهەنگڵ.

**چووارهێندە:** چارکاسە.

**چووارییەک:** لە چووارپەشان بەشێک. — بەر: لە چووارپەشان بەشێک بەر.

**چووارییەکی:** چارێکی.

**چووارێن:** چووارگۆشە.

**چووارین:** چوورە.

**چووالە:** چەقالە، بادامی فەریک، دارەکەشی گەڵای وەکوو بی وایە بە ناوی بەرەکەیەوە ناو دەبرێت بەرەکەی تاڵە و خۆشدەکرێت.

**چووالەبادام:** چووالەی ناووک شیرین، فەریکە بادامی شیرینی ڕەق نەبوو.

**چووالەبایەوا (کۆ.):** بادامی دەستچێن.

**چووالەتاڵە:** جوورە چووالەیەکی تاڵە.

**چووالەشینکە (کۆ.):** بادامی کێوی.

**چووالوو:** لە ڕێوی گەورەترە دوو دەستەکانی پاشووی لە دەستی کورت ترە و خاوێنترین داعبایە ژووری تایبەتی خۆی هەیە لە لانی خۆیدا و پووشی لەسەر ڕاخستووە، کورەبەشە، چالەکە، ووشەک، لە دەوری ژوورەکەی خۆیدا لەبەر شێ بستێکی قووڵکردووە هەر لە ناو ژوورەکەی خۆیدا کەمێک دوور ژوورێکی بۆ نازووقەی زستانێ دروستکردووە و هەر لە بەرانبەر وێش کەمێک دوور ئەدەبخانەی دروستکردووە. (کۆ.) چووارناڵە، بە ـ چوون: بە ـ هاتن، غاردان بە تاوو تەوورژم و چووارناڵە.

**چووان:** بەخت.

**چووانـدن:** بـەختکردن، پـارەچووان: خـەرجکردن لـەناوبردن، لـەنێو ـــ: لەنێوبردن، تووناکردن.

**چووانو:** بەختکراو. لە دەست چوو، لەکیس چوو.

**چووە** (هەورا.): (ڕەوا.) ڕکە.

**چووەر** (هەورا.، ئەردە.): ژوور، دیو، چاوە.

**چووبەچوو:** بەرانبەر، بەرابەر.

**چووپ** (باک.): داگیرکردنی چت. (ئەردە.) درۆ، چاپ، چاپو چووت.

**چووپی:** چۆپی.

**چووتن** (زا.): جوونی چت.

**چووجەر** (فە.): فەلاقە.

**چووچ** (باک.): کیری منداڵان.

**چووچان** (باک.): ووڵاخی شکست.

**چووچک** (باک.): کەوچکی داری ماستاوێ، گچکە، چکۆڵە. (باد.) چۆلەکە، پاساری، بۆ هەمموو باڵندەیێکی گچکە بە کاردەبرێ.

**چووچکە:** چووێچکە.

**چووچڵە:** قیتکە، خەمشە، چیچک.*

**چووچی** (باد.): وەکوو چیچی وایە بۆ دانیشاندنی منداڵ بەکاردەبرێ.

**چووخە:** چۆغە.

**چووخێتی:** چەختی، چەقسوو، سووراو، پەل، بێ شەرم.

**چوور** (باک.): چوورک، (باک.) چز، پیاو یا ژنێکە تووکی سەری خورمایی بێ. ـ کرن: تاودانی تووک، ڕەنگکردن. (زا.) شەل، لەنگ. جوورە مەڕێکە. (باک.) بزنەمەرەز.

**چووڕ** (ئەردە.): چۆڕ.

**چووڕڕە:** چورڕا، چرڕە، باڵندەیێکی بۆرە هێندەی چۆلەکەیەکیە و لە مەزرایاندا دەژی، چوڕڕەپۆپنە.

**چووڕڕەپۆپنە:** چوورڕە.

**چوورتم** (هەورا.): وەنەوزە، خەوەنووچکە. (زەن.) کارەسات، ڕووشە، نەگبەتی.

**چوورک** (باک.): چوور، چز، مرۆڤێکە تووکی سەری خورمایی بێ.

**چووز** (ئەردە.): ڕاوێژی (چووزان)ە. چووزان: ڕیگبازی، ۳ وێنەی لە فەرهەنگی مەردوخ دایە لاپەرە ۵۸۵. (موک.) گزگل، تیل، تیلک، (ڕەوا.) تیلکە، (کۆ.) بز، (هەورا.، باک.) بوز. ـ پێوەکردن: بزدان، تیلک پێوەکردن. لکی ناسکی تازەی دارانە، چووزە، چەکەرە، چەقەرە، دارێکە پەیوەند (مەتوریە) کرابێ. ـ کردن: پەیوەندکردن.

**چووزان:** سووتانەوەی پێست.*

**چووزانـەوە:** کولانـەوە، کزانـەوە، سۆڵانەوە، دەسـتی قەڵەشـاو، لـووت دەچووزێتەوە لە سەرمان یان لەبەر چتی تیژ و توند.

**چووزاندنەوە:** کزاندنەوە، کولاندنەوە، سۆڵاندنەوەی ئەندام.

**چووزانم:** چزانم، چدەزانم، نازانم.

**چووزە:** توولـە باریکـەکانی مێـو و ئیدیکـە، چەقـەرە، تـووزە، چووقـرە، توورزە، چووزەرە، چووزەڵە، چوویزرە، چووەر، هەر ڕووەکێکی تازە سەری لە سەر زەوی دەرهێنابێ و ڕەنگی سپی بێ و هێشتا ڕەنگی کەسکی وەرنەگرتبێ ـ ی پێدەڵێن، توولەی کورتی دارانە.

**چووزە پوونـگـە:** چووزە پوونە.

**چووزەخەیار:** ئیسکەخەیار.

**چووزەرە:** چووزە، چەقەرە، تـووزە، چووقرە، توورزە، چووزەڵـە، چوویێزەرە، چوویزرە، لاسکی ناسکی گیایە، توولـە باریکەکانی مێو و ئیترە و هەر ڕووەکێکی، کە تازە سەری لە سەر زەوی دەرهێنابێ و ڕەنگی سپی بێ و هێشتا ڕەنگی کەسکی وەرنەگرتبێ ـ ی پێدەڵێن.

**چووزەشووانە:** گیایەکی بەهارییە و گەڵایەکەی وەک بەڕەزا وایە لاسکەکەی بە ناسکی دەخورێ.

**چووزەکە** (هەو.): گەمـەیێکی منداڵانەیـە، لەسـەریەک لاقـی دەڕۆن، هەنگڵەشەلە.

**چووزەکێ** (کۆ.): شایی و هەڵپەڕکێیە.

**چووزەڵە:** سووسکە، چووزرە، چووزە، لاخ، (کە.، هەو.) چووزەرە، (شا.) سـەرچووزەڵە. چەقـەرە، چەکـەرە، سـەرتوولەی مێوییـە و بـە گیـا و ڕووەکێکی دەڵێن، کە بە قەد درزێکی لـە خاک دەرچووبێ و لـە چەقـەرەی گەورەترە.

**چووزرە:** چووزەڵە.

**چووزرکە** (سوور.): گۆمزە.

**چووقان:** قووچان، نووقان، لێکنران.

**چووقاندن:** ـــ ی چاو: قووچاندن، لێکنـان، نووقـاندن، ـــ ی دەست: نووقاندن.

**چوقاو:** قووچاو.

**چووقاوەوە:** قووچاوەوە.

**چووقە:** دەنگی وێک کەوتنی ددان لەسەرمان.*

**چووقەی دیان:** چرکەچرکی ددان.

**چووقین:** تکان، بۆڵەبۆڵ و پرتەپرت کردن بە ژێر لێوانەوە.

**چووک** (باک.): چکۆڵە، گچکە، بچووک، چۆلەکە. (موک.) ئەندامی شەرمی نێرینانە.

**چووکانە** (باک.): جوورە گەمەیەکە.

**چووکە:** بڕوانە: چووک.

**چووکەڵ:** نێوی نێرینانە.

**چووکەڵە:** گچکە، بچکۆڵە، چکۆڵە.

**چووکدان:** لەسەر ئەژنۆ دانیشتن.*

**چووکفریّ** (باک.): جوورە گەمەیەکە.

**چووکک** (باک.): چووکێتی.

**چووکڵ**: تۆ، بە ـ . دوو ـ : بە کلۆ، دوولۆ. چووێچکەی گیا و دارانە. ڤیرگول، بۆر، چیکلە.

**چووکڵە** (هەورا.): چیلکە. (کۆ.) سووچی دەرەوەی قولینچکی چتی سێ سووچە. مندالّی تاقانە. چووکڵی ددانانە.

**چووکڵۆچێو** (کە.): کۆتەڵی دەغڵ ودان.

**چووکێتی**: (باک.) گچکەیی، چووکک.

**چووگان** (زا.): گۆچان.

چووگان

**چوول** (ل.): دار.

**چووڵانـە** (کـەل.، زەن.): لـەسـایـە، لـەمیهرەبانی، سـایـە، سەبارەت؛ لە ـ ی تۆوە پێکهاتووە: لە سایەی تۆوە پێکهاتووە.

**چوولە**: مرۆی قەشمەر.

**چوولیت** (دەر.): خەزێم.

**چووم**: ڕۆیشتم: (هەورا.) من لووانیّ، سەرچاوەکەی (چوون) ە.

**چوون**: ڕۆیشتن، (هەورا.) لـووای، (دەر.) چین، چوویین، شوون، بچۆ، هەرە، بچە، برۆ. لەدەست چوون، لـە نـاوچوون، نـەمان، لـە نێـو چـوون، تۆفدان، تووناوتوون چوون، چوونە نەبوون، هەرەشیان، هەرەشین. سڕ و بیّ هەست بوون، لە گۆکەوتن، تەزین: فەرهاد دەست و پێی چووە لـەسـەرمان واتـە سڕوبیّ هەست بـووە لـەسـەرمان. لـەخۆ ـ: بێهۆشبوون، هەڵچوون. درێژە. لـەسەر ـ: لـەسەر ڕۆیشتن: درێژەپێدان، ورێچوون، لێکردن: وەوی ـ لەوی کرد. پـەڕینی وولاخی یەکسم، تـەقینی هێلکە و ڕژانی بۆ نـاو ئاوور، دامراندنەوی ئاوری گڕ: ئاوەرە جوو واتە: دامرکایەوە، دراوێکە لـە کاتی چت کڕیندا لێت وەربگیرێت.

**چوونەبەست**: ڕێگا بەستران، ماوەی چوون بەستران.

**چوون بەیەکا**: تێکبەزان، چوونە ناو یەکتری.

**چوونەدەر**: (هەورا.) بەرشیەی، لووای بەرەوە، وەدەرکەوتن، بەدەرکـەتن، دەرکەوتن، دەربوون.

**چوونەژوور**: وەژوورکەوتن، (هەورا.) ئاماوە چووەر.

**چوونەژێر**: ددان بە چتێکدانان، درکاندن، چوونە ژێرباری کارێکی.

**چوونە سەر**: سەرکەوتن، سەلیل بوون، وەسەرکەوتنە سەرجێگایەکی بڵند. پێکهاتن، بەئەنجام گەیشتن، تەواوبوون.

**چوونەسەراو**: چوونە سەرپێشاو.

**چوونەلا**: دروستبوونی پیاوە لەگەڵ ژنەکەی.

**چوونەنێو**: چوونەناو.

**چوونەنێودڵ**: چوونە نێو دڵەوە، کەوتنە نێودڵەوە.

**چوونەو** (لو.): وەها، ئاوا، وا.

**چوونەوە**: دووبارە چوونە شوێنێکی. ڕەنگ نەمانی کالاّوبەن و چتی تر.

**چوونەیەک**: گرژبوونی هێندێ تەنراو بە هۆی تەڕبوونیەوە.

**چوون بەیەکا**: چوونەیەک، پێکچوون، هەڵپێکیان.

**چووێ** (فە.): چی؟. (زا.) برین، زام.

**چوویت** (هەورا.): شوویت، (ڕەوا.) دۆراخ، جوورە دەرمـانێکی شینیشـە لـە نـاو ئـاو دەکرێ سـتیلی سپی و هـەندێ کـالاّی تـری تێـوە دەدرێ بـۆ جوانی.

**چووێچکە**: ـ ی داران، ئەولکەدارە چکۆلـە و شلکانەیە، کە لـە بن لکـە گەورەکانی داران دەری دەکات، وەچ، وەچە، چووکڵە، چووچکە.

**چووێدار**: بریندار.

**چووێر** (موک.): گێڕ، چووێل، (هەورا.) چەوێڵ، چەوت، لاق خووار و خیچ، گێڕ، بۆ مرۆڤ و وولاخ و ئاژاڵ و هی وا بەکاردەبرێ، کەلاق یا پاشوو بنگێوێ و لێکبدات. (خۆ.) کەسێکیشە لە کـاتی ڕۆیشتنێدا پانیـەکانی لێک دوور و پەنجەکانی نزیکی یەکتری دابنرێن.

**چووێشتیر** (موک.، خۆ.): بزنێکە هێشتا نەزابیّ یا ساڵێکی تەگەی نـەگرتبیّ و قسربیّ، (بابا.، هەورا.) چتیر، (دەر.) چوشتیر، (بـاک.، زەن.) تشتوور، پشتیر، تشتیر، تووێشتیر.

**چووێشکە**: چۆلەکە.

**چووێک** (باد.): چۆلەکە.

**چووێڵ** (ڕۆژ.): چووێر، وولاخێکە هەر دوو پاشووی گێڕو کەوانەدار بیّ و لە ڕۆیشتنێدا پاشووی بنگێوێ، واتە سەمەنگوڵ بیّ.

**چووین**: ڕۆیشتین.*

**چوویین** (ل.): چوون، ڕۆیشتن.

**چهار** (باک.): چووار، ٤.

**چەپیز** (باک.): تۆپ، هی تۆپان و گەمەیە.

چەپیز

**چیّ**: گیاندارێکە، کە چەش بوو بیّ. (باک.) باش، چاک، قەنج. (ڕۆژ.) کووێ، کێندەرێ، کووێندەرێ. دروست، ساز؛ پێم ـ ناکرێ: پێم دروست ناکرێ. (هەورا.) لێرە.

**چێبوون**: چەشبوونی گیاندار. دروستبوون، سازبوون، تـەواوبوون، چابوونەوە، چابوون.

**چێبوویی** (باک.): گەیشتنی میوە.

**چێتر** (باک.، زا.): چاتر، چاکتر، باشتر، قەنجتر.

**چێتی** (باک.): گیایەکە، گیایی.

**چێچ**: کێچ.

**چێچە**: سەرگۆی مەمک.*

**چێچەرۆک** (باک.): چرچرۆک.

**چێچکا** (باد.): چۆلەکە.

**چێخ**: ڕوش، ڕوشان، داڕوشان.*

**چێخیز**: (باک.) جەخز، چەرخ، ئاڵقە.

**چێدار** (باک.): کەلەپچە.

چێدار

**چێدمای** (هەورا.): لـەمەولا، لەمەودووا.

**چێر** (باک.، زا.): پاشملە، ـ ی من دکە: لە پاشملەی من دەدوێ. چێڵ، مانگا.

**چێڕ** (هەورا.، جا.): چڕ، گـڕ، ددانگـڕ. (ئـەردە.) دۆست وبرادەر. شێر. (کۆ.) فێر، دانە خۆرە، چەشـە، چەشەخۆرە، ڕاهاتوو. ـ بـووە: فێربووە، چەشـەخۆرەبووە، ڕاهاتووە. (هەورا.) ژێر، بن. (لـەک.) کێرد، چـەقۆ. (ئەردە.) تێڕ.

**چێران** (باک.): لەوەڕان. ـ دن: لەوەڕاندن.

**چێرە** (باک.): چێرەگـە، لەوەڕگـە، قـەرەبوو. (ئـەردە.) دەم و چـاو، ڕوخسار، چارە. ـــ بوون: قەرەبوو بوون، تۆڵەبوونەوە.

**چێربێژ** (باد.): گۆرانی بێژ.

**چێرپیاڵە** (هەورا.): ژێرپیاڵە، ناڵبەکی.

**چێرت** (زا.): ڕیقنە.

**چێرچەناگە** (هەورا.): ژێرچەناگە.

**چێرچێر** (باک.): جیرەجیری پێنووسییە.

**چێرخان**: ژێرخان، (هەورا.) ژێریانە.

**چێرزەمین** (هەورا.): ژێرزەمین، ژێرخان.

**چێرک** (دزە.، هەو.): ئەوڕیشووە براوانەیە، کە بەسەرداری ئەونییەوە دەمێنێتەوە دووای کۆتایی و بڕینەوەی کرداری مـافوورە و بەڕە و چتی دیکە. (دزە.، هـەو.) پـۆی ئەونییـە، کـە لەسـەرەوە بـۆ خـوارەوە شۆڕدەبێتەوە، چێرگ.

**چێرکرن** (باک.): جنێودان، دژوونکرن.

**چێرکۆتەی** (هەورا.): ژێرکەوتن.

**چێرگ**: بەت، چرگ، مێشەسپی، باڵندەیێکی لاق و مل درێـژە و گۆشـتی دەخورێ لە قاز گەورەترە. پـۆی مـافوورە و بـەڕە و جەواڵـە، (شـاگی): هۆزێکە لە نزیک شاری کۆیە.

**چێرۆک**: داستان و حیکایەت.*

**چێرۆکەوان**: چیرەدرێژی، درێژەپێدان، لێنەبڕینەوە.

**چێرومێر** (ئەردە.): دۆست و برادەر.

**چێرێ** (باڵە.): کووێ، کووێندەرێ، کێندەرێ، (هەورا.) کۆگە. (باک.) چەرە، لەوەڕ، لەوەڕگە.

**چێری** (باک.): چێلی، فەرخەی وولاٚخانە.

**چێریان** (باک.): لەوەڕان، (باک.) چێران.

**چێریانە** (هەورا.): ژێرخانە.

**چێریاندن** (باک.): لەوەڕاندن.

**چێرین** (باک.): لەوەڕان، لەوەڕین.

**چێژ**: تام، چێژە، چست، (ڕۆژ.) چەشکە.

**چێژان**: تام کردن، چێژتن.*

**چێژە**: تام، مێزە، مەزە.

**چێژتن**: مێزەکردن، (هەورا.، ڕۆژ.) چەشتن، یەکێکە لە پێنج هەستەکان.

**چێژک** (باک.): منداڵ.

**چێژکە**: چێشکە.

**چێژیلە**: چۆلەکە.

**چێش** (شەبە.، هەورا.): چی، چییە؟.

**چێشت**: (هـەورا.) چاشـتی، (دزە.، هـەو.) شـیو، (هـەورا.) چاشـت، چاشتی، (باک.) گرار، (دەر.) ئاش، گێرمی، خواردەمەنیەکە لـە سـەر ئاگر دروست دەکرێ.

**چێشتان**: چاشتەنگاو، چێشتەنگاو، تاشت، نانی قاوەڵتوونێ: تێشت، کاتی نێوانی بەیانی و نیوەڕۆیە.

**چێشتانە**: شاگردانە، بەخششێکە، کەبەشاگردان دەدرێ.

**چێشتە**: گۆشتێکە بـەبێ داو لـە شـوێنێکی دادەنرێت تا شـەوێ جانـەوەر بیخوا جا بۆ سبەی شەوێ تەڵـەی بە گۆشتەوە بۆ دادەنرێتەوە، کە هات بیخوات پێوە دەبێت، گیانداری چەش.

**چێشتەتەڵە** (شا.): (کۆ.) چەشە، (هەورا.) چەشتـە، دانـەخۆرە، گۆشتە یا باڵندەیێکە لە نێوتەڵەی دابنرێ بۆ ڕاوێ.

**چێشتەخەو**: خەوی چێشتانە.

**چێشتەخۆشە** (ئەردە.): کەرەستەی چێشتێیە.

**چێشتەقوڵە**: چێشتە قوڵێ.

**چێشتە قوڵێ**: (هـەو.) شێوە قوڵێ، شیوە قولاٚنێ، (هـەو.، ڕەوا.) شیو شیوانێ، کۆکردنەوەی چەند جوورە خواردەمەنییەکـە لـە لایـەن چەند منداڵێکییەوە، کە دابەشی دەکەن بە ناوخۆیاندا.

**چێشتەکوڵێن** (ئەردە.): چێشتەخۆشە، تفاق. پێویستی چێشت لێنان بەشی جارە چێشت لێنانێک.

**چێشتەنگاو**: چێشتان، چاشت، چاشتەنگاو، تاشت، کاتی قاوەڵتوونێ، چێشتانگاو، چاشتیگا، پێش نیوەڕۆیە.

**چێشتەنوویژ**: نوویژی چێشتانێیە.

**چێشتخانە**: ئاشخانە، ئاشگە، جێگایەکە، کە هەر چێشتی تێدا لێبنرێ.

**چێشتکەر**: کەسێکە پیشەی هەر شیو لێنان بێ.

**چێشتلێنان**: (شەم.، مزو.) پاتن، (باک.) گرمان، پەهتن.

**چێشت لێنەر**: ئاشتچی، (هەورا.) چاشتکەر.

**چێشتن**: چەشتن، چێژتن، چەژتن.

**چێشتی نێواری**: شێو، شام، نان و خواردنی شەوێ.

**چێشتی بەیانی**: تێشت، نانی بەیانی.

**چێشتی خۆش و چەوور**: خەزو بەز.

**چێشتی سبەینێ**: چێشتی بەیانی.

**چێشتی کۆنی شەوێ**: شەومەند، چیوەڕۆک.

**چێشتی میوەجاتان**: کەسمە.

**چێشتی نیوەڕۆیە**: تاشت، فراقین.

**چێشکە**: چەشکە. ـــ کردن: چەشکەکردن.

**چێکە** (هەورا.): لێرە.

**چێکردن**: چاکردن، تەواوکردن، دروستکردن، دامـەزراندن، بەرقـەرارکردن، پینەو ساخکردنەوە، چەشکردنی گیاندار. (باد.) چاککردن، چاکردن.

**چێکرۆخ** (باک.): دانەر، ڕێکخەر، دروستگەر.

**چێکڵە** (ئەردە.): چوکڵە.

**چێکنە** (لو.): چنینی چت بە ووردی.

**چێگا** (هەورا.): لێرە.

**چێگە** (هەورا.): ئێرە.

**چێگەولا** (هەورا.): پاشان.

**چێل** (باک.): یاد، بیر. ـــ کردن: یادکردن، وەبیرهێنانـەوە. (باک.) تات، تەختەبەرد، تاوێرەبەرد، خووار، خێچ.

**چێڵ** (هەورا.): کەوی مێ. (هەو.) مانگا، چێر.

چێڵەک

**چێڵەک** (باک.): مانگا، چێڵ.

**چێڵەکەڵ** (باک.): کووچە.

**چێڵەکی** (باک.): جوورە ماسییەکە.

**چێڵک** (ئەردە.): داری سووتەنی.

**چێلکە**: داری باریکی سووتاندنێ.

**چێلکەو** (باک.): کەوی بۆر، باڵندە.

**چێلکەچنێ**: کۆکردنەوەی چیلکە بۆ چاووگی ئاگر.

**چێلکڕ**: باڵندەی کورک، کە لەسەر هێلکان هەڵنیشتبێ بۆ جووچکە هەڵێنانێ.

**چێلکڕ** (ئەردە.): باڵندەی کڕ، پاداو، باڵندەییێکە لە ناو تەڵەی دادەنێن بە خووێندنی وی باڵندەی تریشی پێوە دێن و پێوەدەبن، باڵندەی ناوبراو بە زۆرترینی کەوە.

**چێلی** (باک.): (ئاموده.، باک.) منداڵ، زارۆ. فەرخەی ووڵاخان و مار و باڵندە.

**چێلیک** (باک.): گوورێلک. بێچوو، فەرخە.

**چێن**: تۆوچێن. قسە چێن.

**چێنران**: داچێنران، وەشێنراو، تۆوی وەشێنراو بەزەویدا.

**چێنراو**: داچێنراو.

**چێو** (هەورا.): چت، چتمەک، شت، شتمەک. (ڕۆژ.، بابا.، جا.، کرما.): چیلکە، داری سووتاندنییە. لەتاریکی کوتان: وەدووی چتی پرووپووچ کەوتن. (دەر.) چاو. برەدار.

**چێوان** (موک.): چیلکەوچێو.

**چێوەتەقێ** (ئەردە.): گۆچان کوتانی کوێر بۆ ڕێگا دۆزینەوە.

**چێوەزمە** (شارە.): چلوورە.

**چێوەسان** (کۆ.): جوورە برپەندێکە.

**چێوبەس**: چێوبەست.

**چێوبەست**: داربەست، کەپر.

**چێوتاش** (ئەردە.): دارتاش.

**چێوجەڵە**: دارێکی خوواره بە قەد بستێکی لە قوڵفی گوریسێکی دەکرێ، کە ڕەشە ووڵاخی پێدەبەسترێتەوە. بەڕوولەی دەوار. پێنج پارچەداری کورت و تایبەتییە دەخرێتە نێوانی پەنجەی دەستی تاواندارانەوە بۆ ئازاردانی.

**چێودار**: چۆدار(بۆ.، کەل.)، کەسێکە بە جەڵەب ڕەشە ووڵاخ و ئاژاڵ و ئیتر بکڕێ بۆ فرۆشتنەوەی.

**چێوداری**: چۆداری.

**چێودەس**: چێودەست.

**چێودەست**: چێودەس، داردەست.

**چێوشەقە**: دارشەق.

**چێوکاری** (ئەردە.، هەورا.، کرما.): دارکاری. ـ کردن: دارکاری کردن.

**چێوکوت** (ئەردە.): سیخناخ، دارکاری.

**چێوور** (باک.): ترسێکی لەپڕرایە، ڕاچڵەکین. ـ بوون: ڕاچەنین. ـ کردن: ڕاچەناندن.

**چێووڕەش** (هەورا.): دارفرۆش.

**چێ یۆک** (باڵ.): مانگا.

**چێیی**: سارد.

**چێیگ**: سارد.

**چی**: هین، هەرامە: ـ یەکەم لە بیرچوو: هینەکەم لە بیرچوو. (هەورا.) بۆچی؟، لۆچی؟، چی بەدووای هەر ناوێکییەوە بنووسێ دەبیتە نیشانەی بکەر: چایچی، چەخماخچی، شەکەرچی. (هەورا.) لەم، لەمە، (بۆچت و کەسی نزیک). ـ سەرزەمینە: لەو سەرزەمینە. چی؟، چ؟، چ چتێک، چ شتێک، (دەر.) چووێ. ـ دەکەی: چدەکەی؟. (فە.) وەکوو، وەکی، (فە.) ئەڕاچی.

**چیا**: کێو، کەژ، شاخ، بەن.

چیا

**چیاڤان**: شاخەوان. ـ ی: شاخەوانی.

**چیای باڵەکیان**: کێوێکە کەوتۆتە ڕۆژاوای گەلی عەلی بەگ و گوندی باڵەکیان.

**چیای زینی دەرگەڵەی**: کەوتووتە باکوری ڕۆژهەڵاتی ڕەواندزێ بەرەو حاجی ئۆمەران.

**چیامانی** (ئەردە.): سەرمابوون، ئارەقەی لەش لە بێ تاقەتی. *

**چیای بستێ**: کێوێکە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕەواندزێ بەلای حاجی ئۆمەرانەوە.

**چیاو** (شارە.، جا.): ئاوی سارد، ڕچیاو، بەستەڵەک، بەستوو، سڕ، تەزیو، چتی سڕوسارد.

**چیای ئاگرین**: کێوی ئاورین، چیای ئاوور پژێن.

**چیانی** (ئەردە.): مرداره ئارەق، ئارەقێکەلە بێ تینی پەیدادەبێ.

**چیایێ ستمی**: کێوی قووڵ وچاڵدار.

**چیە**: بۆ پرسین و وەڵامدانەوەی بانگکەر. *

**چیپ** (باک.): ڕووت، قووت، تاک، تەنها، تەنیا. (باک.) نەرم، شل. چیم، لاق، لوولاک.

**چیپلاخ**: ڕووت،(باک.) تازی.

**چیت**: تەنراوو چنراوی لۆکەییە ڕەنگاوڕەنگە ژنان بۆ پۆشاکی بە کاردەبەن، پارچە، (هەر.) چیغی کورتە بۆ بەرخان. (باک.) تیغە، پەردە چیغ.

**چیتر**: چیدی، هیچی دی.

**چیتک** (باک.): قەفەقامیشێکە، کە دەرمانی تێدابێ، لوولەی قامیش و ئاسن.

**چیتۆکە** (باد.): چتی خراپ و کەم نرخ.

**چیچک** (زا.): چیچک.

**چیچە** (هەورا.): (هەورا.) چیچکە، مەمکی ئافرەتانە، گۆی مەمکییە، گووان، چلی گووان.

**چیچەک**: دەریاچەی وورمێ.

**چیچەلاس**: هوورک و وەزایە، گچکەو لاواز.

**چیچەلۆک** (باد.): جووچکەی مریشک و پەرەوەران، جووجیلە.

**چیچرک** (زا.): سیسرک.

**چیچک** (باد.): جووجیلەی مریشکان و چۆلەکە. مەمک، گۆی مەمکی. (سۆ.) سێچکە، جوورێکە لە بەرەکانی دارە مازوو.

**چیچکان** (هەورا.): جوورە دانیشتنێکە، لە سەرهەردووک پێیان بە جوورێکی وا، کە قوونی نەگاتە سەرزەوی.

**چیچکە** (شن.، ڕەوا.): بەڵگەی گوێچکەیە، شلکەکەی خوارەوەی گوێیە، نەرمایی گوێچکە. (کۆ.) وورتکەنان، چینچک. ـــ کردن: کەمە دانیشتنێکەبە سەرچیچکانەوە.

**چیچکۆک** (بار.): سێچکە.

**چیچلە**: چیچکە.

**چیچلەمەچان**: جوورە گەمەیەکە منداڵان لە سەر چیچکان قونە دەکەن و بەرەو یەکتری دەچن کوڕوکچان و چەپڵە لێدەدەن.

**چیچی**: (هـ.) مەمک، چیچکان، چنچکان. ووتەیێکە بە منداڵی ساوا دەکوترێ تا دانیشێ. دانیشە.

**چیچیلە**: نەرمایی و بەڵگەی گوێ.

**چیخ**: (باک.) چیت، چیغ. ـــ کردن: خشانی گوللەیە بەسەر جستە داو رووشاندنی. سەرکردنی گوللە و تیر و بەرد و ئیتر، کە وە قەراخی نیشانە بکەوێ وکەمێک دایڕووشێنێ. مەبەس لە وێستانی خەڵکە بەگردی چتێکیدا بە زۆری.

**چیخماڵ** (کۆ.): ماسی گرتنە لە گۆماندا بە چیغی.

**چیدی**: هیچی دی، چیتر، هیچی تر.

**چێڕ**: دۆس، دۆست، یار.

**چیر**: ڕیچ، جیرە، ددان لەـــ وەبردن: ددانەڕچکێ، چیرتن، چیرقاندن، قرساندن، (ڕۆژ.) خەت، خێز، هێڵ. نووزە درێژ. شێر، شێرگیر، چیرە. (کۆ.، موک.) چتێکە بەرەنج و ئازار و هێز بکشێ یا بپسێ یان لەت بێ. (باک.) جنێو. دژوون.

**چیراندن** (ئەردە.): زیقەی کەو.

**چیرانن**: جیقاندن.

**چیرە**: جیقە، جیکەی کەو. زاڵ. ـــ بوون: زاڵبوون. ـــ کردن: ڕیچکردنەوە، زاڵکردن. قرچە، جیرە. لە ددانەوە هاتن: قرچوون. ـــ وەبوون (ئەردە.): ڕیچبوونەوە.

**چیرەچیر**: دەنگی ددانان ودەرکەو تەختەو ئیدیکەیە، جوورە دەنگێکیشە لە کەوەوە دێ.

**چیرەدرێژ**: دەنگ بڵند و تیژ و درێژو ناپەسند، چەنەسووک، چەنەباز، زۆر بلێ. ـــ ی: چەنەبازی، زۆربلێیی، چەنەسووکی.

**چیرەوەکردن**: چیرە لە ددانان هێنان لەڕقان.

**چیرچیر**: دەنگی ددانانە.

**چیرچیرۆک** (هەورا.): باڵندەیێکی کەسک و زەردە هێندەی دووتوکانە لە نێو ڕەز و دەغلاندا دەژی پەیدابوونی وی نیشانەی دووایی بە هارێیە، کە سێکیش لە جێگایەک یا لە شووێنێک شین بێتەوە دەڵێن دەڵێی ـــ ە. چیرۆکی گچکە.

**چیرقاندن** (باک.): ددان لە چیرەوەبردن.

**چیرقین** (باک.): چیرقاندن.

**چیرک** (باک.): پارچەو نەختێک میوەی ووشکە، لەتکەی سێو و هەلووچە و هەرمێ.

**چیرکەو** (باک.): کەوی بۆر.

**چیرۆک**: چرچرۆنک، داستان، خەبرۆشک، چێچەرۆک، چرچرۆک، چیرۆنک، چیڤانۆک، قەواتی، بەسەرهات وداستان.

**چیرۆکە**: چیرۆک.

**چیرۆکبێژ**: چرگەر، داستان بێژ. ـــ ی: داستانبێژی.

**چیرین** (باک.): لەوەڕانی ئاژاڵان. (باک.) جنێودان، (باک.) بچیرە: جنێوبدە.

**چیز** (زا.): خەرەنگەزە، دەنگی هەڵاتوو و شکەست خواردووە.

**چیس**: ـــ کرن: دانەدەست، ئەسپاردن، پێ ئەسپاردن. (ڕۆژ.) دەنگێکە مەڕی پێدازۆن، چش، چسس.

**چیش** (ڕۆژ.): چیس.

**چیغ** (باک.): سینگی دار یا ئاسن. (موک.، باک.) چیت، لەبەن و قامیش دروستدەکرێ بۆ پەردە و دەورەی خێوەتان.

**چیغکردن**: چیخکردن.

**چیڤ** (باک.): دەنگی جیکەجیکی جووجیلەی مریشک و پەرەووڕانە، (باک.) چاو.

**چیڤانۆک** (باک.): قسەی پڕوو پووچ، چیرۆک. کۆمەڵە. کۆمەڵبوون، کۆبوونەوە.

**چیق** (باک.): قامیش، لاقی گیاندار، (باک.) لەڤەن. لا. پەنجەی پێ.

**چیقاڵ** (باک.): لاواز، بێ تین.

**چیقڵدانە**: پشوو درێژی، ددان بە جەرگی خۆ داگرتن. بێ ـــ: پشووتەنگ، قیسکە تەنگ.

**چیقڵدان**: چیکڵدانە، گەیە، گەدە، خورگە، زیقەتۆرە، وورگ، ئاشک، سیکەتۆرە، پەمزیزانک، بەرچلک، سیق، سیقەدانە، (هەورا.) چیقلەدانە.

**چیک** (باک.): چرووسکەی ئاوری، پریشک، پارچە، تیسکەی خوری و لۆکە و ئیتر. (باک.) تانەی سەرچاو. (باک.) چرژ، ئاوشار. (باک.) هەرامە، هین، وانێک، تەنها بۆ نێران بەکاردەبرێ.

**چیکەنە**: (باک.، هەو.، کۆ.) چرک، (باد.، باک.) دۆلاب، دۆلاڤ، خەرەک، چەرخێکە بە بادان پەمۆ لە پەمۆدانە خاوێن دەکاتەوە، مرازێکە لۆکەی شێ دەکاو دەپیشکنێتەوە و پەمۆدانەکەی لێ فڕێدەدات.

**چیک چیک** (باک.): لۆب، لۆب، گلەیی، گازندە، بۆڵەبۆڵ.

**چیکرووت** (باک.): چۆک ڕووت، زیقەتۆرە، چیقڵدانە، توورەکەیەکە لەبەر سینگی باڵندەدایە خواردنی تێدەچێ. ـــ ی وولاخ و ئاژاڵان: وورک.

**چیکنە** (ڕۆژ.): ئەسپێی مریشک و باڵندانە.

**چیکلێکێ** (باک.): ئەووک، هەرامە، هین، بۆ مێیان بەکاردەبرێ.

**چیگەو** (هەورا.): لێرە.

**چیل** (زا.): فیلێ. ماکەو. (جا.) جنجڕ بۆ باڵندەی کێوی و کەوی. (زا.) پووشی کورتان. (ئەردە.) بەڵەک، ڕەش و سپی، ڕەشبەڵەک. (باک.) گیایەکە، ڕەشی بازوو، سپی بێ پەڵە. گیایی. (هەورا.) ماکەو، ژەرەژ.

**چیلاز** (شن.): لاواز، باریک.

**چیلان** (زا.): سۆرانی باریکی درێژ.

**چیلە** (ڕەوا.): سنوور، تخووب، (موک.) قەمتەرە، (باک.) پەنک، چەند بەرد یا دارێکە بۆ سنووری دوو زەوییان دادەمەزرێ. (دزە.، کۆ.) پەرژین، تانۆک، تەیمان، شوورە. شوورێنێکە، کە زۆر بەرز بێ و گژ و گیاشی زۆربێ. (خۆ.) دیوارێکە بە ووشکە بەردان لە قەراخ باخ و باخچان کرابێ، سنوور، تخووب. (بابا.) ـــ کردن: بەرقەوە تەماشاکردن، چاو لێهەڵگێڕانەوە، چاولێ مۆڕکردنەوە.

**چیلەچەپ** (زا.): پیادەڕێ لە چیایاندا.

**چیلە قرپ** (باک.): ڕێگای پێچدارو باریک، ڕێگای خووارو خێچ.

**چیلچیلە** (کۆ.): بەڵگەی گووێ.

**چیلک** (موک.): (باک.) چلک، نەرمەو بەڵگەی گووێیە. (سل.، باک.) چلک، گیایەکە بەرەکەی وەهێشووی ترێی دەچێ و وورده، کەگەیشت ڕەش هەڵدەگەڕێ و شیرینە دەکرێتە خۆشاو گۆیا لە خۆشاوی مێوژی زۆر خۆشترو شیرینترە. (باد.) بالۆکە.

**چیلکە**: وورده داری باریکی ووشکی تووپۆپی دارانە بۆ سووتاندنێ، چووکڵ، چووکڵە، هزرۆک، چیکڵە، چیڵک، داری سووتاندنێ.

**چیلکەوچێو**: (موک.) چێوان.

**چیلکەوکردن** (ئەردە.): دار شکاندن بۆ سووتاندنی.

**چیلگەر**: قفڵساز.

**چیلی بۆز** (باک.): بۆز، سپی و ڕەشی تێکەڵاو.

**چیلیان** (دەر.): ژووری ئاووردوو، دیوی ئاگردوو.

**چیم** (چ): تیپی سێزدەمینی ئابێی کوردییە. (باک.) بەشی خووارەوەی لوولاکان، چیپ. (ڕۆژ.) ئەو قوڕولیتەیە، کە بە گیاو چایەرەوە بە پێی مالاّتانەوە هەڵدەکەنرێ یا هەڵدەکەنرێ و لە شوورێنێکی تر دەچێنرێ یا لە پێش جۆگەی دادەنرێ تارێ ئاوەکە بگۆڕێ. (باک.) زەوییەکە پڕلە ڕەگی گیای فریزووبێ دووای فریزوو ڕنینەوە، (کۆ.) گیاو گوڵی ڕەنگ تێک ئالاّو، مێرگ، چیمەن. (جەبا.، کە.) بەردی ڕەقی سووڵوی نێو ئاوێیە. (باک.) لوولاک. من چیم، ئەمن چیم، لە(چی) و (م) پێکهاتووە، چی: چتە، (م) یش ڕاناوی تاکەکەسی یەکەمی ئامادەیە.

**چیمەن**: زرچک، مێرگشە، چەمەن، چەمەنزار، مێرگ، چیم، (باک.) خێلانی، شوورێنێکە چیمی زۆر بێ بە فریزوو داپۆشرابێ. (باک.، باد.) گیارەش، گیایەکە وەکوو فریزووی وایە هی زۆزانان بنەکەی وەکوو پیفۆکییە و دەخورێ.

**چیمەنتۆ**: چەمەنتۆ، جوورە لمێکی شینکارە لەگەڵ لم و خیزی تێکەڵ دەکرێن و دە گیرێنەوە ولەقسڵ بە هێزترە بۆناو ئاوو بۆسوواخی دیوارو سەربانان.

**چیمەنزار**: چەمەنزار، (باک.) چائیرخانە، لەوەرگە، مێرگ، چیمەنگە.

**چیمەنی ووشک**: ڕەپەن.

**چیمک** (وان.): دان، دانە، دانی باڵندان.

**چیمن** (لو.): ڕۆیشتن.

**چیمۆکان** (کۆ.): قەڵەشتن و توویژ ئاوێژتنی کەمێک لەسەرەوەی نینۆکان دەڵێن.

**چین**: قەد، دەق. ـــ ی جل و بەرگان: قەدی جلوبەرگان. ـــ کردن: قەد، دەقکردن، چەرمکاندن. (باک.) پەڵە، نوختە، لەککە. (موک.) جار، چەل، کەرەت، نۆبە، ڕا. ـــ ی دیواری: ڕیزی دیواری. (موک.) تیپ، دەستە، ڕیز. ـــ سووارێک: دەستەسووارێک. ـــ یێک لە چتێک، ڕیزێک لە چتێک. (موک.) گرژی نێوچاوان، چینی جلوبەرگ. لۆچ، لۆچی ڕوو، کۆرمیچەک، چەچی. ـــ دار: لۆچدار، (دەر.) چوون، ڕۆیشتن.

**چیناوی**: جووره پارچەیێکی ئاوریشمی جووانی ڕەنگاوڕەنگە ژنان دەیکەن بە کالاّ.

**چینە**: مەلوومووشی باڵندە لە زەویدا بە شووێن خواردن و دانەوێڵەدا. پشتی مرۆڤ لە باب و باپیرەوە، ڕەچەڵەک. دان، دانە. ـــ کردن: چونگکردن، دانەهەڵگرتنەوەی باڵندانە، خەپراندن، خەپارتن.

**چین بەچین**: دەستەبەدەستە، چین چینە، چتی خاڵدار، چین لەسەرچین.

**چینی پێشانی**: دووژنک، لۆچ و گرژی نێوچاوان.

**چینچک**: چتێکی کەم. ئەگریجە.

**چینچکە**: چیچکە.

**چینچۆڵەک** (باک.): جۆلانەی چکۆڵە، چۆلانۆکە.

**چین چین**: لۆچ، دەستەدەستە، تەبەقە تەبەقە، ڕەنگاوڕەنگ. ـــ کردن: دەستە دەستە کردن.

**چینچینک**: نوقورچ.

**چیندار**: لۆچدار، چرچ. ـــ کردن: قەرمچاندن، گرژکردن، چکووڕاندن.

**چینداری**: لۆچداری، چرچی.

**چین دەم و چاو**: لۆچی ڕوو.

**چێنراو**: تۆوی چێنراو.

**چینک**: چینەی باڵندانە، چیندان، چیکڵدانەی باڵندان.

**چینکرووت** (باک.): چۆک ڕووت.

**چینکۆ**: ڕووکێش. جووره تەنەکەیەکی ئەستووری ڕووکێشکراوە. جووره دەفرێکی ناسراوە. جووره چیتێکە.

**چینگ** (زەن.): زەنگ، زەنگوڵە.

**چینوماچین** (هەورا.، هەو.، باک.): مریشکەچینی.

**چینی**: کەسێکە هی وولاّتی چین بێ. قاپودەوری، فەخفوری، دەدەلیک. جووره دەفرێکی گڵێنی زۆر لووس و پووس و تەنکە وەک شووشە وایە. دانی مریشک و باڵندان.

**چیو**: سڕ، بەستوو لەبەرساردی، ئاوی سارد. (هەو.) پارچە دار یا ئاسنێکی تەنک یا باریکە لە تەنیشت چتێکی دەکوترێ تا چتەکە نەلەقێ. داری دەست، داری سووتەمەنی.

**چیوەتقێ**: کەرپان، پشکنین.

**چیوەرۆک** (خۆ.): چێشتی شەوێی کۆنەیە، شەومەنە.

**چیوبەس**: داربەس، داڵووت، چەفتە، تەختێکە لە چرپی و شووڵ چنرابێ. داربەست بۆبەنایی.

**چیوتاش**: دارتاش.

**چیوچەڵە**: چەوچەڵە، فرفرە، پارچەدارە لە نێو پەنجەی تاوانبارانی دادەنێن بۆ ئازاردانی.

**چیوچیوە** (ڕەوا.): دووداری کورت و گچکەیە هەریەکەی سەرێکی دار باگردانە لە باگردانەکە قایم دەکرێت، (خۆ.، هەورا.) سیوسیوە.

**چیودەس** (ئەردە.): گۆچان، داردەست.

**چیێگ** (هەورا.): سارد، تەزیو. ئاوی ــ: ئاوی ساردو تەزیو.

**چیەولای** (هەورا.): لەمەولا، لەوەپاش.

**چیو دەم سەگ**: داری دەمی سەگ.

**چیوشەقە**: دارشەقە، مرۆی شەل و یایەک لاق پێی دەڕوات.

**چیوکاری**: دارکاری.

**چیوکوت**: دارکاری. جەنجاڵ، پڕ، جمکوت.

**چیونەڕشانئیان**: دارلەسەرشان دانان.

**چیوهەلاجی**: داری هەللاجی.

**چییە** (ئەردە.): پۆیەی چت. (شەبە.) چیە، چێش؟، (هەورا.) چێشە، (دەر.) چوورێست، (جا.) چەسن، چۆیە، چی. (ئەردە.) نیشانەی چت.

# ح

**ح**: تیپێکی ئابێی کوردییە.

**حا**: ها، ئاها، توخوا، بەڕاستیتە، ئەها، پیاو لەکاتی واق وڕمانێدا بەکاری دەبا. لەکاتی پێداهەڵشاخان. (شارە.) بۆ لێخوڕینی ڕەشەوڵاخان بەکاردەبرێ.

**حاپۆلک**: ڕێدان بە دوورخستنەوەی هەڵماتێکە، کە لە تیلکردنـدا لەبەرهەڵستێک کەوتبێ و وێستاندبێتی لە هەلماتێ یاری کەرەکانی تر بۆ ئەمەی، کە نەیکووژن.

**حاپوول**: حاپۆلک.

**حاتۆر**: دارێکە گێچی پێ دەکوترێ.

**حاجەت**: کەل وپەل.

**حاجی**: کەسێکە دیدەنی ماڵی خووای کردبێ.

**حاجی نۆمەران**: هاوینەهەوارێکی خۆشە و کەوتۆتە نێوان سنووری عێراق و ئێران.

**حاجی بادام**: خواردەمەنیەکی شیرینی ناسکە لە زەردێنەی هێلکە و نیشاستە دروستەکرێ.

**حاجی بایەف**: حاجی باییف. جوورە چەقالەیەکی دەنک گەورەیە.

**حاجی باییف**: حاجی بایەف.

**حاجی بەیان**: حاجیلە، گیایەکە لەناو دەغڵ و دانێدا شین دەبێ. بەری گیایەکییە، کە لەناو دەغڵاندا دەڕوێ.

**حاجی ڕەش** (باد.): پەڕەسلێرکە، پەڕەسێلکە.

حاجی ڕەش

**حاجی ڕەنگ** (باد.): حاجی ڕەش.

**حاجیلە**: (باد.) گوڵخەزێم. گیایەکە بەکوتراوی داوێژرێتە سەرجێگای دووپشک پێوەدراو. ئارەقەکەشی لەچاوی تێکچوو و ژاندار بکرێ زۆر بەسوودە. گوڵێکی بەهاری لاسک بەرزە وەک نێرگز وایە، بەڵام چاوە زەردەکەی بەرزە. بەری گیایەکییە لە نێو دەغڵیدا دەڕوێ و تاڵە. حاجی بەیان.

**حاجی لەقلەق**: حاجی لەگلەگ.

**حاجی لەگلەگ**: حاجی لەقلەق باڵندەیێکی ڕەش وسپی و دندووک و لاق و مل درێژو ناسراوە.

حاجی لەقلەق

**حاچە**: ئەم سەرو ئەو سەری درێژایی ڕەشماڵ یا خانوو، لە (حاچە)ی ڕەشماڵەکەوە وەستابووم واتە لەسەری درێژاییەوە. پەل و لک. ئەم دارە دوو ــ: دوولکە، دووپەلە.

**حاحا**: هاها، ئاها، حا، حەو. بەدوورزانین. لەکاتی باوەڕ پێنەکردن و ناپەسندیدا بەکاردەبرێ. ووشەیێکە ڕەشەوڵاخی پێ لێ دەخوڕرێ.

**حادحادک**: (باک.) دارێکە لەقەراخ ئاوان دەچەقێنرێ.

**حارەب**: ئارەو، تات، تاتک. عارەب.

**حارەبانـە**: عارەبانە، وەکوو عەرەبان. عەرەبانە، فایتوون، ئارەوانە.

حارەبانە

**حارەب قۆزی** (کە.، هەو.): گیایەکی هاوینی تا دوو بستان بڵند دەبێ، گەڵایەکانی وەهی هێرۆی دەچێ لەسەری تەنها گوڵێکی بەقەد سێوێکی گەورە بەڵان وەکوو هی گوڵەبەڕۆژە لەپێشدا سوورە، کە گەڵای وەراند سەلکی گوڵەکەی بەشێنی دەنوێنێ بۆ دەرهێنانی کۆلکەکەی نیو بەژن هەڵدەکەنرێ کۆلکەکەی زۆر قورسە و لیچق و زەردە دەڵێن بۆ هەوێنی زێڕ دەبێ یاخۆی دەبێتە زێڕ حۆقەی ٦ دیناران دێنی.

**حارەب گاگۆزی** (باد.): سەرسەری، کەسێکە کاروباری بێ جێ بکات.

**حارەبی**: زمانی ئارەوی، نەژاد ئارەو.

**حاردان** (سور.، خۆ.): عاردان، زۆرانی گرتن، زۆرەوانی گرتن.

**حارک**: گیایەکە بەشلکی جووان دەخوورێ و چووار پێیانیش کە بیخۆن پێی قەڵەو دەبن.

**حاست**: ئاست، عاست، بەرانبەر، حەن، حەناس، جێگا، ڕاست، رووبەڕوو، تەک، هاست. لە ــ تۆدا: لەڕاست تۆدا.

**حاستەم**: هێدی، هێواش. دژوار، سەخت، هاستەم، هەستەم.

**حاش** (زا.): چتی بێ کەڵک. (باک.) ئامرازی بانگ کردنێیە بۆ بزنان بەکاردەبرێ واتە ڕاوەستە.

**حاشار**: پەنهان.

**حاشا** (ع.): گووپدان، بەپشت داکەوتن. هیچ کاتێکی.

**حاشاردان**: شاردنەوە، داپۆشین، پەنهانکردن.

**حاڵ**: نوود، ژیوار، بار، جیوار، هاڵ. ڕەنج، ئازار. بەهەزار ــ گەیشتمە ئێرە: واتە بەهەزار ڕەنج.

**حاڵور** (خۆ.): بەهەوا، بەهەوەس، سەرسەری، بزۆز، بەفیز، فیزدار، هەوادار.

**حاڵۆری**: بزۆزی، فیزداری.

**حالووک**: حەلووک، حولیچکە، هەڵووژە، هەڵووچە.

**حاڵی**: تێگەییو، تێگەیشتوو، پێ گەییو، زانا، تێگەییک. ــ بوون: ئاگاداربوون، تێگەیشتن، زانین. ــ کردن: تێگەیاندن، ئاگادارکردن.

**حاملان:** ڕەنێوهێنران، پەروەردەکران.

**حاملاندن:** بەخێو و پەروەردەکردن، ڕەنێوهێنان.

**حامی** (ڕۆژ.): ناقایم، نامەحکەم.

**حان:** کەسێکە، کە گێتی دیتبێ و گەلێ باری تاقی کردبێتەوە، بارام زۆر ـــ ە: زۆر خاوەن بەراوەردە. حاست، ڕاست. لەم ـــ ەوە تەماشاکە: لەم حاستەوە تەماشاکە.

**حانابە** (بار.): خلێنە.

**حانەحەپەشێ:** دەمەوەری و چەنەبەچەنە وەستانی یەکێک بۆ یەکێک.

**حاوانەوە:** حەوانەوە.

**حاواندنەوە:** حەواندنەوە، بەخێوکردن.

**حاوێن:** حاوێنەر، بەرگەر، پەروەردەکار، ڕەنێوهێنەر.

**حاوێنەر:** سەرپەرشتکەر، حاوێن.*

**حاوی** (کە.): زەوییێکە دۆڵ و نزم وباشبێ.

**حەبان** (باک.): جەڕڕەی ئاوێیە.

حەبان

**حەبحەب** (زا.): ووشەییێکە پاڵەوانان و ئازایان لەکاتی شەڕێدا دەیڵێن بۆ دەرخستنی هێز و توانایی خۆیان.

**حەبداڵ:** دڵدار، گراو، سەوداسەر، ماخۆلیا. کەسێکە بەشووێن سەودای سەریدا بگەڕێ.

**حەبداڵی:** دڵداری، سەوداسەری.

**حەبدۆیی:** عەبدۆیی. سمکۆ کە مایەی سەربڵندی کوردان بوو لە تیرەی حەبدۆیی بوو.

**حەبی** (زا.): لۆکەی نەکراوە.

**حەبیشاندن** (زا.): زۆر خواردن بەپەلە.

**حەپ:** حەپە، دەنگی سەگی، وەڕەوەڕ.*

**حەپان:** حەپین، وەڕینی سەگ.

**حەپاندن:** حەپەکردن، وەڕینی سەگان.

**حەپە:** گەفە، حەپەحەپ، وەڕە، وەڕینی سەگە بەهێواشی، دەنگی سەگی.

**حەپەحەپ:** گەفەگەف، عەوعەوی سەگییە، یەک لەدووای یەکتری، وەڕەوەڕ، کەوتەکەوت، حەپحەپ. ـــ کردن: حەپاندن.

**حەپەسان:** پەشۆکان، سەرسووڕمان، سەرلێ شێوان، سەرسام بوون، واق وووڕمان.

**حەپەساندن:** سەرلێ شێواندن، پەشۆکاندن، سەرسام کردن.

**حەپەساو:** سەرسام، پەشۆکاو، سەرلێ شێواو. گیاندارێکە سەرسام بووبێ.

**حەپەلۆک** (باد.): گیایەکە.

**حەپەنگ** (ئەردە.): مەردومی حەپۆلە.

**حەپلەری** (باد.): جوورە هەنارێکە.

**حەپلۆس** (ڕۆژ.): منداڵی قەڵەو و تێکسڕماو. (خۆ.) حەپۆنە.

**حەپنەگ:** حەپۆل، گێژ، گێل، بێهۆش، گەوج، سەپوول.

**حەپۆل:** گێل، گێژ، وووڕ، حۆل. گێژو وێژی قەپۆلە.

**حەپۆلە** (ڕۆژ.): نانی گچکەی منداڵانەیە. حەپۆل.

**حەپۆل مێشخۆر:** گێل، گێژ، وووڕ. کەسێکە لەبەر گێلی و گێژی مێشی لەخۆی دەرنەکات.

**حەپۆنە** (خۆ.): مرۆی زل و ووورگن و تێکسرماو. (ڕۆژ.) حەپلۆس.

**حەپوو:** هەموو.

**حەپوول:** حۆل، گێژ، وووڕ. (شن.) حەل نەبوون، بەهەندنەگرتن. حیساب نەبوون لەگەمەدا دەڵێن: ـــ م چی: واتە لەسەر منی حیساب مەکەن.

**حەپین:** وەڕین، حەپحەپکردنی سەگانە.

**حەتا:** تا، هەتا، تاکوو، هەتاکوو.

**حەتار** (زا.): گێچ کوت، کەسێکە گێچی بکوتێ.

**حەتاڵ:** بەتاڵ، خاڵی، چۆڵ. بەتەنهایی بەکار نابرێ بەڵکوو دەڵێن: بەتاڵ و حەتاڵ.

**حەتەق:** ئاها، هاها. لەکاتی باوەڕنەکردن و واق ووڕمانێدا بەکاردەبرێ.

**حەتحەتۆکە:** چەند توورەکەیێکی بچکۆلەیە دەرمانی بۆنخۆشی تێدەکرێ لەملی منداڵان دەکرێ تا بە بۆن نەکەوێ.

**حەترەک** (زا.): لێدان بە نهێم.

**حەتۆتە** (کە.، هەو.): نشتوو، حەتحەتۆکە. حەمایەل، بەرمووورێکە، کە مووورووی زل و نشتووی پێوەبێ زۆرتر منداڵ و کچان لەملی دەکەن.

**حەج:** زیارەتی مەکە، زیارەتی کابە. ـــ کردن: دیدار لە ماڵی کابە. دوواترین مووشێکە، کە لە گەمەی مووشێنێدا دەخورێ.

**حەجامەت:** خووێن گرتن لەناو شان یا لەشووێنانی تری لەشی مرۆڤان بەکەڵە شاخ.

**حەجامەتگا:** شووێنێکە، کە حەجامەتی لێ دەگیرێ. شووێنێکە لە لەش، کە حەجامەتی لێدەگیرێ.

**حەجامەتگر:** کەسێکە، کە حەجامەت لەم و لەو وەردەگرێ.

**حەجامەتگرتن:** بەکەڵەشاخ خوێن لە لەش گرتن.

**حەججە هەی** (دزە.): ووشەییێکە بزنە گەلی پێ لێدەخوڕن.

**حەجمان:** حەجمین، تەبتین، ئارام گرتن.

**حەجماندن:** ئارامکردن، تەبتاندن.

**حەجمین:** تەبتین، ئارامگرتن، هێدی بوون، بێ دەنگ بوون، سرەوتن، هەواداان، حەجمان، ئۆقرەگرتن، ئارامی.

**حەچ:** چەگان، دارێکی سەرخووارە لەیاری (حەچان) یدا لەگۆی یارییەکەی پێدەدرێ.

**حەچە:** حەچچە، بۆ لێخوڕین و ئاژۆتنی کەرێ بەکاردەبرێ. (ئەردە.) سابرێن، نێری، تگە، تەگە.

**حەچان:** یارییەکی دوودەستییە بەگۆو بە حەچ دەکرێ.

**حەچاندن:** هێنانە وەڕینی سەگ. وەچەڵتەچەڵت خستنی کەسێک. حەچەلیکردن.

**حەچچە** (ڕۆژ.): حەچە، هەچە. لەکاتی تووڕەبوون و نزیک بوونەوەی دوژمن لەو. بۆ ئاژۆتنی کەر و ئێستران بەکاردەبرێت.

**حەچەحەچ:** حەچەحەچە، هەچەهەچ، هەچەهەچە. بۆ ئاژۆتنی کەر و ئێستران بەکاردەبرێ.

**حەچەحەچە:** بڕوانە: حەچەحەچ.

**حەچەل** (ئەردە.): گێچەڵ، دەبە، شڵتاغ.

**حەچوولوور:** وەڕین و لوورەی سەگییە.

**حەچیکە** (زا.): ووتەیەکە لە جیاتی ووشەی (ئەگەر) بەکاردەبرێ.

**حەد:** شایان، شیاو، ڕێکەوتن. ـــ ی نیە: ڕێی ناکەوێ.

**حەدەف** (زا.): تەپۆڵکە.

**حەراج** (زا.): هەراج.

**حەرام:** چەپەڵ، خراو. (ع.) نارەوا، چتێکە خودا قەدەغەی کردبێ لە کردنی یا لە گوتنی یا بۆ بیستنی.

**حەرامزادە:** بیژوو، زۆڵ، جارووِ، بیژی. ـــ یی: بیژوویی، زۆڵی.

**حەربلین** (زا.): گڕێ خواردنی گوریسە.

**حەرد:** ئەرد، ئەرز، زەوی، حەرز.

**حەرز:** هەرز، حەرد.

**حەرسیلە** (باد.): بەردێکی گۆشەدارە لەسەر سیلەی دیوار دادەنرێ لەکاتی دروست کردنیدا لەلایەن وەستاوە.

**حەرگ** (زا.): قوڕ، ئاو و گڵی تێکەڵاو.

**حەرماندن** (زا.): پیسکردن.

**حەرمەل** (باک.): گیایەکە بۆ نەخۆشی باداری باشە.

**حەری** (باک.): قوڕ.

**حەریر:** هەڵوایە، کە لە دۆشاو و ئارد دروستدەکرێ بە پارچەکراوی هەڵدەگیرێ بۆ خواردنی زستانێ. دێیەکی کۆن ومێژوویییە لەنێوانی شەقڵاوە و چیای سپیلکییە.

**حەریف:** هاوتا، هاولف.

**حەز:** هەژ، ویست، ئارەزوو، هەوەس. هۆک، خۆشی. ـــ کردن: هەژکردن، ئارەزووکردن، ویستن، هەزکرن، هەژکرن. (دەر.) سەیر، حەنتیکە، عەنتیکە.

**حەزار** (باک.): هەزار.

**حەزلێکەر:** ئارەزوومەند. ـــ ی: دڵداری، دڵدارێتی. ـــ ی کردن: دڵداری کردن.

**حەزلێکردن:** دڵدارێتی کردن، ئەڤینی. ئارەزووی چتێکی کردن.

**حەزیا:** هەزیا، هەژدیها، ئەژدەها.

**حەزیرانی** (زا.): جۆرە هەرمێیەکە لە مانگی حوزەیرانێدا پێدەگات.

**حەژ** (با.): حەز.

**حەژدە** (با.): هەژدە.

**حەژدەهی:** کاتێکە، کە مەردوم بۆ دیدەنی یەکتری تێیدا کۆدەبنەوە.

**حەژمەت:** ئەژمەت، سووێ، خەم، پەرۆش، هەژمەت، تاو، خەفەت. لە ـــ ان: لە تاوان.

**حەژێکرن** (زا.): حەزلێکردن.

**حەس:** ووتەیەکە بەکاردێنرێ لەکاتی سەرسووڕمانێدا.

**حەسار:** حەوش. دیوار، پەرژین.

**حەساری سەکران:** سەرچاوەی ڕووباری ڕەواندزێیە. دووەمین کێوێکی بڵندە، کە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەلاتی ڕەواندزێ. حەساری سەکری سەکران.

حەسار

**حەسانەوە:** سرەوان، سرەوتن، تەواسان، سانەوە، ئاسوودەبوون، پشوودان، پشی دان، ئارامگرتن، ئارام بوون، بەسەرچوونی ماندووێتی.

**حەساندنەوە:** ڤەسپاندن، ئاسوودەکردن، ئارام کردن، سرەواندن، حەسانن، ژووژانن.

**حەسانن:** حەساندنەوە، ساندنەوە.

**حەساو** (ع.): حیساب، ژمارە، ئامار. حەساوە.

**حەساوە:** ئارام، ئاسوودە، ئارام گرتوو، حەساوەوە، ساوەوە.

**حەساوگەر:** حیسابگەر.

**حەسەنا:** ئێلێکی کوردی ناودارە لە نزیک شاری مووشێیە.

**حەسەنەزیتە:** حەسەنە سستە.

**حەسەنەسستە** (هەو.): باڵندەیێکە لە قەتێ گەورەترە سپی و ڕەشە، سەری زۆر بڵند و کلکی کورت و لاقی درێژن. (دەر.) حەسەنەزیتە.

**حەسەن بەگ:** چیایەکی زۆر بڵندە هاوینانیش بەفری پێوەیە کەوتۆتە باکووری ڕەواندزێ.

**حەسەنی:** خێڵێکی کوردە لەسەدەی چاردەمیندا لە کەرکووک و هەولێر دادەنیشتن بەڵام ئێستا لەنێو چیایەکانی دێرسم دادەنیشن.

**حەسەنێ مووسا** (باک.): نێوی گۆرانییێکە.

**حەسپەن:** دڵداری شێت و شەیدا، گراو.

**حەسپن:** بروانە: حەسپەن.

**حەسس:** حەس.

**حەسحەس:** کەسێکە بەشەو کێشکی ئاوایی بگرێ.

**حەسیان** (ئەردە.): حەسانەوە.

**حەسیانەوە** (ئەردە.): حەسانەوە.

**حەسیر:** بەلاج، بیانەک. (شەم.) حەسیل. (باد.) حەسیلک. چتێکە لەپووش دەچنرێ و لەژێر لباد و بەڕە و مافوورە لەسەر زەوی ڕادەخرێ. کەزی.

**حەسیر باف:** کەسێکە، کە حەسیری دروستکا.

**حەسیر مەیدان:** لەسەر ڕووڕاکشاندنی یەکێکییە بۆ ئەوەی لەبەرچاوی خەڵکی دارکاری بکرێ.

**حەسیل** (شەم.): حەسیر.

**حەسیلک** (باد.): حەسیر.

**حەش:** وورچ، هورچ.

**حەشار:** پەنهان، سو. گەهەک، جێگایەکی سەختە، جێگای حەسانەوەی گیانلەبەرانی کێوییە.

**حەشاردان:** شاردنەوە، پەنهانکردن.

**حەشاردراو:** شاردراوەوە.

**حەشارگە:** جێگای خۆلێشاردنەوە، مکۆ، بنەگە، شاردنگە، (شار.) قۆختە. وەشارگە، سەنگەر. (هەورا.، موک.) سیپە.

**حەشەرەلا:** حەشروحەلا.*

**حەشەری:** کەسێکە ئێجگار شەهوانی بێت، لەبەر زۆری شەهوەتی لەڕاست نێر و مێیاندا بێ. شێوازو سەرسەری بێ. پتر بۆ ئافرەتی حیز بەکاردەبرێ.

**حەشەتووره** (ئەرده.): گیایەکە لەکاتی بێ تووتنیدا لە جیاتی تووتن دەکێشرێ.

**حەشت:** هەشت.

**حەشتا:** حەشتێ.

**حەشتێ:** هەشتا.

**حەشده** (باک.): هەژده.

**حەشدەلا** (ئەرده.): هەراهەرا.

**حەشر:** هەوڵ، تەقەلا، کۆشەوە. ـــ کردن: تێکۆشین، هەوڵدان، تەقەلادان. زماندرێژی، ڕیسوایی.

**حەشرەلا:** هەرا، هەنگامە.

**حەشرپێکردن:** ڕیسواکردن، گاڵەپێکردن، شرکردن.

**حەشرکردن:** ئەوپەڕی هەوڵدان.

**حەش سەد** (باک.): هەشت سەد.

**حەشیفاندن** (زا.): نووسین.

**حەشیمەت:** دەستەمرۆیەکی زۆره، کۆمەڵە مرۆڤێکی زۆره.

**حەفت** (هەو.): حەوت (۷).

**حەفتا:** حەفتی، هەفتێ (۷۰)، حەڤتێ.

**حەفتار** (زا.): کەمتیار.

**حەفتامین:** حەفتاهەمین.

**حەفتانە:** حەوتانە، حەوتووانە، مووچەیێکە، کە هەفتەوهەفتە بدرێ.

**حەفتاو** (ئەرده.): حەوتجار شووشتنی چتێکی گڵاوه بۆ ئەوەی گڵاوییەکەی نەمێنێ، سپلۆتی.

**حەفتاهەم:** هی حەفتا، حەفتام.

**حەفتاهەمین:** حەفتامین.

**حەفتە:** حەوتوو، حەوتە، هەفتە، ناوه بۆ حەوت ڕۆژان، کە یەکێک لە ڕۆژەکانەوه دەست پێدەکات بۆ وێنە لە هەینییەوه بۆ هەینی یا لە دووشەمەوه تا دووشەمەیێکی تر بەو پێیە.

**حەفتەکۆک:** جووره کاتژمێرێکە هەفتە بەهەفتە کۆک دەکرێ.

**حەفتەکێش:** ووڵاغ لەپاش زانی بە هەفتەیەک دەیخەنە بەرفەحل، چاکردنی ماین و ماکەر لەدووای زانی بەیەک هەفتە.

**حەفتەم:** حەوتەم.

**حەفتەمین:** حەوتەمین.

**حەفتەوانان:** حەفتەوانە، حەوتەوانە.

**حەفتەوانە:** حەفتەوانان.

**حەفتەیی:** هەفتەیی، حەوتەیی، حەوتوویی.

**حەفت ترنگە:** مزراویلکە.

**حەفت ترنگێن** (جەبا.): جلبڕ، مزراویلکە. مزرۆکەی ترشە بە هێلکەوه.

**حەفتجۆش:** حەوجۆش، حەوتجۆش، جووره مەسینەیەکی ڕەش و ئاسنە.

**حەفترەنگ** (زا.): حەوترەنگ، غەزەل و کری حەوترەنگ.

**حەفترەنگە:** چێشتێکە لەگەڵێ سەوزی دروست دەکرێ.

**حەفترەنگیلە** (ئەرده.): باڵندەیێکی بچووکی ڕەنگاوڕەنگە بەقەد چۆلەکەیەکییە.

**حەفترەنگینە:** باڵندەیێکی ڕەنگاوڕەنگە هێندەی پاسارێکییە.

**حەفترەنگە:** قولتەشینکە، قورتە، قولتە، قورتک (باڵندەیە). حەوڕەنگیلە.

**حەفتلۆ:** حەوت تووێلکە.

**حەفتم** (کە.): کوشتی و قوربانێکە بە بۆنەی لە دایک بوونی منداڵ دووای حەوت ڕۆژان و یامردنی دووای حەوت ڕۆژان.

**حەفت مێرده:** حەوت مێرده.

**حەفتۆرم** (زەن.): حەوتەوانان.

**حەفتێ:** حەفتا (۷۰).

**حەفتی** (زا.): حەفتە.

**حەفتیار** (باک.، باد.): کەمتیار.

**حەفتیەک:** حەوت یەک.

**حەفتیر:** حەوتتیر، جووره دەمانچەیێکە.

**حەفسەد** (باک.): حەوتسەد.

**حەفک** (باد.): ئەستێ.

**حەفی حەفت سەر:** هەژدیهای حەوتسەر.

**حەفجۆش:** حەوجۆش.

**حەفیان:** زۆرخۆر.

**حەفی** (ئەرده.): هەژدیها، حەفیان.

**حەڤە** (هەورا.): حەڤده ۱۷.

**حەڤتێ:** هەفتا، حەڤدێ.

**حەڤدە:** حەوده، هەڤده ۱۷. (هەورا.) حۆده.

**حەڤدەم:** حەڤدەهەم.

**حەڤدەمین:** حەڤدەهەمین.

**حەڤدەهەم:** حەڤدەم.

**حەڤدەهەمین:** حەڤدەمین.

**حەڤدێ** (باک.): حەڤده ۱۷.

**حەڤیان:** حەفی، زۆرخۆر.

**حەڤی حەڤسەر:** هەژدیهای حەوتسەر.

**حەڤەپەڵە:** بارانێکە، کە لەنێوەڕاستی پاییزێدا بباریٚ.

**حەڤەوەسێن:** چتێکە، کە تۆڵەی کەم و کوڕی چتێکی پێش خۆی بکاتەوه.

**حەڤحەڤکەره:** تاقتاقکەره، جووره گوندێکە.

**حەقلیمەقۆ:** گەمەی (کاڵەمستێ) یە. حەلەقامەلەق.

**حەقلیمەقان:** حەقلی مەقۆ.

**حەقیق:** ئاقیق.

**حەک** (موک.): دەک، یاخوا.

**حەککو، حەکوو** (خۆ.): ئاها ،هاها. لەکاتی باوەڕنەکردنێدا بەکاردەبرێ.

**حەگاڵ:** ئاگاڵ. جوورە پەتکێکە جووان وکشت بادراوە ئارەوان لەسەر چەفیە یا جەمەدانییەوە لەسەر سەریانی دادەنێن.

**حەڵ:** بایەخدار، جێی بڕوا و باوەڕ، حیساب. حلێب. ـــ بوون: بایەخداربوون، حیساب بوون. ـــ کردن: بایەخدارکردن، حیسابکردن. ـــ نەبوون: حەپوول. دەم، کات، چاخ، جار، نۆبە، چەل، هەل.

**حەلا:** هەلا. ـــ بوون: هەلاهەلابوون. ـــ کردن: هەلاهەلاکردن.

**حەللا:** هەللا، کەپوورە، هەرا، هەنگامە.

**حەلاقی** (سابلاغ.): جوورە ترێییەکی ئاڵی گلوو خڕە و دەنکی هەیە و بۆ مێلاق دەبێ.

**حەلان** (باد.): بەردی پان، تاتە بەرد، تاوێری بەرد.

**حەلانە** (کۆ.): بەردێکە بۆ گێچ دەست بدات. دەفرێکی پووشینی چنراوە خورمای تێدەکرێ.

**حەلاوێ** (موک.): بەفرینە، شیرو شەکرە لەنێو بەفریدا پەروەردە دەکرێ وەکوو قەیاخی لێدێ، هاوینان دەیخۆن.

**حەلەق و مەلەق:** قسەی هیچ و پووچی بێ سەروبێ، حەقلی مەقۆ. حەقلی مەقان، گەمەی هەلاَدۆشە. ووتەیەکە لەیاری کاڵەمستێدا دەگوترێ. حەقلی مەقۆ، هەلاَدۆشە.

**حەلەل:** حەلەلا، کسکس، هش هش، دەی، دیی، بۆ تێبەردانی سەگ بەکاردەبرێ.

**حەلەلەلە:** (کە.) هش هش. کسکس، دەی، دیی. ووشەیەکە بۆ هاندانی شەڕسەگی و تێبەردانی بەکاردەبرێت.

**حەلقەنەنگوست:** ئاڵقەیێکی بێ نقێمە لە قامک دەکرێ.

**حەلقەبەگوێ:** ئاڵقە بە گوێ. مەبەس لەبەندەیە.

**حەلقەدان:** دانیشتنی چەند کەسێک بەگردی. پێچ خوواردنی مار.

**حەلکی:** بایەخ پێکراو، ئەم پیاوە ـــ یە: واتە بایەخی پێ دەکرێ.

**حەللەق مەللەق:** حەلەق مەلەق.

**حەللەلا:** ووتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتێکیدا، کە یەکێک قسەیەکت بۆ بکا و تۆش بەلاتەوە وانەبێ و زۆر دووربێ.

**حەلەیی:** تەنەکە.

**حەلوا:** هەڵوا، خوواردەمەنیەکە لەئاردو ڕۆن وشەکر یا دۆشاو دروست دەکرێ.

**حەلواچی:** کەسێکە کەهەڵوا دروست بکا بۆ فرۆشتنی، هەڵوایی، هەڵواساز، هەڵوافرۆش.

**حەلوایی:** هەڵوایی، چتێکە، کە ڕەنگی وەک ڕەنگی هەڵوا سووربێ.

**حەلووچکە:** هەڵووچە، (دەر.) هەلوویچکە.

**حەلووک:** حالووک، حولیچەکە، هەڵووژە. ـــ ە (خۆ.): هەڵووچە، هەڵووژە.

حەلی شیش

**حەلی شیش** (هەو.): قەلەموونە.

**حەلیم:** کەشکەکی شل، کەشکەزۆردە، فەریکەکەشک، جەرمە، نیوەووشک.

**حەلیماو:** هەلیماو، شلەپلاو، ڕنگاوی چێشتی شل.

**حەلیم شێوێن:** تێلاَ، دارێکە هەلیماوی پێ تێکوەردەدن.

**حەڵێو:** حلێب.

**حەلیووچەک** (باد.): هەڵووچە، هەڵووژە.

**حەم:** لەزاراوەی منداڵاندا بۆ خوواردن بەکاردەبرێ. ـــ کردن: خوواردن.

**حەمی کە:** بیخۆ.

**حەماڵ:** کۆڵکێش، نێرگە، نێرگەی خانوو.

**حەمام** (ع.): گەرماو، کراشۆ.

**حەمامچی:** گەرماوچی، خاوەندوسەر پەرشتکاری گەرماو.

**حەمامۆکە:** حەمامۆکێ.

**حەمامۆکێ:** حەمامۆکە، گومبەزێکی گچکەیە منداڵان لەخۆڵی دروست دەکەن، ئاوڕشێنی دەکەن ودەیپەستنەوە لەپاشان بەچیلکە هوڵۆڵی دەکەن.

**حەمایەڵ:** نشتوو، نوشتوو، سنگ نقیس، (ڕەوا.) بەربەند. (باک.) بەربەژن.

**حەمایل:** نشتوویێکی گەورە لەنێو قایش ولەنێو کان دەگیرێ وڕاست وچەپ لەمل دەکرێت. ـــ کردن: حەمایەڵ وشیرو چتی تر ڕاست وچەپ لەمل دەکرێت. جزدان.

**حەمەدەشین:** (خۆ.) جوورە قەیسییێکی مزرو ڕەنگ زەردو تەرە لایەکی سوورە ولایەکەی تریشی زەردە وە لەمزمژەی تونلو ڕەقترە، زۆر و قەیسی دەچێ ولە هەڵووچەی پەیوەندکراوە، تەرەقی، لەکاتی خۆیدا ـــ ناوێک پێکیهێناوە بۆیە هەر بەناوی وی ناوە.

**حەمەرەمزێ** (ئەردە.): شەڕی ناوخۆ، بەربەرەکانێ.

**حەمبارۆزێ:** پەلامار، هێرش. ـــ دان: پەلاماردان.

**حەمتز:** (زا.) گوێدرێژی گچکەی بەکار.

**حەمحەم** (هەو.، کە.): پنت، پند، چنگنە.

**حەمزک** (زا.): جۆرەخوواردەمەنییەکە.

**حەمس حەمس:** لکە.

**حەمکە** (موک.): مرازێکی کەرستەی تەونییە.

**حەمکە:** هەموو.

**حەمل** (زا.): ڕابوواردن بەقسەی خۆش وگوفتوگۆی شیرین.

**حەموو:** هەموو.

**حەمی** (زا.): هەموو، هەمی.

**حەمیسەن** (زا.): جوورە بزنێکە.

**حەن** (کە.): حاست، ڕاست، عاست.

**حەنا:** حەن، بارە، ڕاست، حاست، عاست. لە ـــ ی ئەودا: لەبارەی ئەودا.

**حەناس**(کە.): حاست، ڕاست.

**حەنەوحەپەشێ:** حانەحەپەشێ.

**حەنەق** (بۆت.): گەمە، گاڵتە، گەپ.

**حەنەک:**(زا.): گاڵتەوگەپ.

**حەنتەر:** عەنتەر، قوونسوور.

**حەنتیکە:** سەیر، عەنتیکە. ڕمووزن.

**حەندەرحۆ:** یارییەکی منداڵانەیە دارێکی ئەستوور لەسەر قۆقزاییێک دادەنێن دوومنداڵ هەریەکەی سوواری سەرێکی دەبن وهەر جارەی یەکێکیان خۆی قورس دەکات وئەویتریان بەرزدەبێتەوە.

**حەندەف:** (زا.): تەپۆڵکە.

**حەندەگۆ:** (زا.): ناوی جوورەگیایەکییە.

**حەنزەڕووت:** جیوەی تیسووەگایانەیە بە ووردکراوی بەهەر برینێکی وەرکرێ چاکی دەکاتەوە.

**حەنزەل:** چەلێک حەنزەل، حەنزەلێن، جوورەگەمەیەکە.

**حەنزەلێن:** چەلێک حەنزەل.

**حەنگ:** ژەنین، خۆپێوەنان، بەر بۆلای پێش یاپاشی کەسێکییەوە لەدوور یا لە نزیک هەڵتەکاندن، لێ ژەناندن،حێنچک. (هەورا.) حینکە.

**حەو:** حێو، ئاها، هاها، هەو، حەی، هەی سەرسووڕمان و وەلاّمێکە بەدەم گەمەوەیەو وا قووڕمانیشە لەکاتی بێ باوەڕیشدا بەکاردەبرێت. ــ بەخوا تۆی بە یادیشدا نایەت.

**حەوا:** بڵند، بەرز، بەرەوژوور، لای ژووڕووی سەر. ئاسمان، بەرزی، بڵندی، هەوا.

**حەوادان:** فڕێدانی شت بەرەوژوور.

**حەواق:** بەرزی: بەو ــ ەوەدای مەنێ، واتە بەو بەرزییەوە.

**حەواڵە:** نزمی، نشێوی، قووڵی.

**حەوان:** (زا.): حەوانەوە.

**حەوانەوە:** حاوانەوە.

**حەوانچە** (ئەردە.): چتێکە بەحەوادا فڕێدرابێ، پەرت، توور، سووڕ.

**حەوانچەبەستن:** قووانچەبەستن، پەرت بەستن، پەرت بوون، کەوتن، کەفتن.

**حەوانچەدان** (ئەردە.): فڕێدانی شت بەحەوادا.

**حەواندنەوە:** حاواندنەوە، حەساندنەوە.

**حەوانن** (ئەردە.): قەدرگرتن و بە مرۆڤ ژماردنی یەکێکدا.

**حەواویی:** بڵندی، بەرزی. کەسێکە هەمیشە سەرەژوور بڕوات.

**حەواویلکە:** حەوانچە.

**حەواویلکەیی:** هاوێژتنی شت بە حەوادا بڕوانێ.

**حەوایی:** حەواویی.

**حەوەحەو:** عەوعەو. دەنگی وەڕینی سەگی.

**حەوەلووشک** (باد.): حەمبەلووشک. گۆیا جانەوەرێکە لەسەر قەلاّفەتی پیرێژنان بەدەم گریانەوە ژنان وە دووی خۆی دەخات بەو بۆنەیەوە، کە لەو نزیکانەدا یەکێک کوژراوە گۆیا ژنانیش وە دووی دەکەون، کە گەیشتنە چۆلێ یەکێکی هەڵدەگری و بۆی دەردەچێ.

**حەوبرا:** حەوتەوانە.

**حەوت:** حەفت، هەفت (٧).

**حەوتا:** حەفتا (٧٠).

**حەوتانە:** حەفتانە.

**حەوتە:** حەوتوویێکە بەسەر بووکاندا بڕوا دووای گوویزتنەوە یا بە سەر زەیستانێدا دەڕوا دووای منداڵ بوونی. حەفتە، هەفتە، حەوتوو. حەپەی سەگ، حەوتەحەوت، حەپەحەپ.

**حەوتە حەمام:** چوونە حەمامی بووکی تازە و زەیستانە لە ڕۆژی حەوتوویدا.

**حەوتەکێش:** حەفتەکێش، ماین یاماکەرێکە دووای زانیان بە حەوت ڕۆژان ئەسپ ونێرەکەریان دەخرێتە سەر تا سەرلەنووێ ئاووس بن.

**حەوتەم:** حەفتەم، چتێکە لە پایەی حەوتیدابێ.

**حەوتەمین:** حەفتەمین.

**حەوتەوانان:** (زەن.) حەفتۆرم. (ڕۆژ.) حەوت برا. (شنۆ.) چارەگا. (هەورا.) حۆتەوانان. حەوت ئەستێرەی گەشەو چوواریان بەرانبەر و سێیانیان بەروودووا لە نزیک قوتبی باکووری.

**حەوتەواز:** حەوتەوانان.

**حەوتەیی:** حەفتەیی.

**حەوتەبەند:** حەوت غەزەلە، کە ووترابێ لەلایەن هەستیارێکەوە لە باسێکاو هەر غەزەلەی جۆرەپاشبەندییەکی هەبێ.

**حەوت برا**(ڕۆژ.): حەوتەوانان.

**حەوت ترینگە:** بڕوانە: حەوت ترینگینە.

**حەوت ترینگینە:** مزراویلکە، حەفت ترنگینە.

**حەوت تووێلکە:** حەوتووێلکە، (خۆ.، ڕەوا.) حەفتلۆ. حەوتلۆخانە، حەوتلۆ. قوونێرێکە هێندەی هێلکەیەکی لێ دێ ودەوروپشتی سوورەو حەوت توویلکەیە.

**حەوتخشتەکی** : چەند هەڵبەستێکە هەر بەندێکی حەوت نیوەهەڵبەستە.

**حەوتڕەنگ:** حەفتڕەنگ. جوورە پارچە (قوماش) ێکە.

**حەوتگۆشە:** حەوتسووچ.

**حەوتگوڵە:** جوورە گەنمێکە هەر لکێکی حەوت گوڵاّن دەردەکات.

**حەوتلۆ** (هەورا.): گورگ نەخۆرە، (شەم.) حەوت تووێلکە.

**حەوتم:** حەوتەم، حەفتم، حەوتوو، ڕەشە وولاّخ و یا مەڕو بزنێکە، کە سەر ببڕێ بە خێر بۆ منداڵ.

**حەوتوو:** (کە.) شەوارە، نۆرەگرتنی حەوتڕۆژانەی ژنی زاوە لەمنداڵەکەی. شەوەرە.

**حەوتوو:** حەوتە، هەفتە، حەفتە.

**حەوتووانە:** حەفتووانە، حەفتانە، هەفتانە.

**حەوتووێلکە:** حەوت تووێلکە.

**حەوتوویی:** هەفتەیی، حەفتەیی.

**حەوتێک:** حەفتیەک.

**حەوتیر:** حەوت تیر، جوورە دەمانچەیەکە حەوت فیشەکان دەخوا، شەشاگر.

**حەوجۆش:** حەوت جۆش، وەکوو ئاسن وایە بەلاّن تورتە.

**حەوحەو:** دەنگی سووار لەکاتی تاودان وهەڵمەت برندا.

**حەوداڵ:** سەوداسەر، گراو، ناچار. ــ ی : سەوداسەری، گراوی، ناچاری.

**حەودە:** حەڤدە.

**حەودەل** (زا.): پەڵووڵە.

**حەورانەوە** (خۆ.): پەنگاوخوواردنەوەی ئاوە.

**حەوز:** گۆلتک، مەهسەر، مەسنا، (کە.، خۆ.) ئەستێرک. (شار.) ئەستێل. گۆل، قوڕنەت، ڕفکە، حەوزی ئاوێ، ئاڤەڤەک، ئاڤزێل،

قوولکەیەکی تایبەتییە ئاوی بچێتە ناو، بن وکەنارەکانی بەقسڵ وگێچ یا چیمەنتۆ سوواخ دەکرێت.

**حەوزانە:** دراوێکە میراو ساڵوساڵ یامانگەومانگ لەخاوەن حەوزی دەستێنێ لە بەرابەر مزی ئاوەکەدا.

**حەوزە:** ناوچە، ناوان.

**حەووزچە:** چاڵاو، ئاوگیر، گۆڵ. حەوز.

**حەووزخانە:** شوێن و ژوورێکە حەوزی تێدابێ.

**حەوزی کەشتی ساز:** شوێنێکە.

**حەوش:** حەسار، ماوەیەکە لەپێش خانوو یان بە چواردەوریدا بەگردی دیوارکرابێ یا تەیان بێ بۆ ئاژاڵان.

**حەوشە:** هەوێز، پەچە، جێگای هاوینی وبەهاریێ وپاییزیی مەڕو بزنانە لەشەوێدا.

**حەوشێ:** حەوش.

**حەوق (زا.):** پلەکانی نێردیوانی.

**حەول وحەوش:** دەوروبەری حەسار.*

**حەوێق:** حەراق.

**حەوێنەوە:** حاوانەوە.

**حەوێنج:** گیایەکە تووەکەی زەردە بۆنخۆشە بەنانی وەر دەکرێتەوە، لەگەڵ شملی و ڕەشکە. شەدانە. توێەکی هووردە بە نانی وەدەکەن.*

**حەی:** حەو، هەو، هەی.

**حەیارە (کە.):** زەوییێکی بچووکە لەدەوری دیواری دەکرێ و لەسەرەتای پاییزی ئاودەدرێت.

**حەیاز (باد.):** چقەی باڵندە.

**حەیاس:** حەیاسە، هەیاسە کەمبەرەیە، کە ژنان لەپشتی خۆیان گرێ دەدەن.

**حەیاس (مامساڵ):** ڕنەیەکە لەپشتەوەی پێی کەڵەبابانە و تەمەنیان نیشاندەدات.

**حەیتە(موک.):** چەتیمۆک، چەتیو، چەتیم، گێل، شێت. بێ شەرم، ڕووداماڵراو، زرتەبۆز. پێشمەرگە، سەرباز. (هەورا.) بێ کار، بێ ئیش.

**حەیچە:** دادوفوغان، هاوار.

**حەیچە حەیچ:** دادوفوغانی یەک لەدووای یەکتری.

**حەیچەیی:** هەی، هەی، حەوحەو، هەوهەو.

**حەیحەی:** ووشەی سەیر و سەرسووڕمانە.

**حەیدەرا:** حەیدەری یان ئێلێکی کوردە لە ئێران و تورکیایەدا واتە لەژێر دەستی عەجەم وتورکاندان.

**حەیران:** کۆنترین گۆرانییێکی کوردییە. باڵاگەردان، ئەز ـــ ێ تەمە: واتە من باڵاگەردانی تۆم.

**حەیرانە:** جوورە گۆرانییێکی ئێجگار زۆرکۆنی کوردییە.

**حەیرانۆکێ:** گۆرانی حەیرانێ.

**حەیزە:** ترخە، بەئاوکەوتن، هەیزە. (ئەردە.) زکچوون.

**حەیزەران:** (لوو. باک.) جێل، تەرکەز. جوورە قامیشێکی ناو پتەوە و زۆر قایمە بۆ ڕەمب وکورسی وخێوەت وچتی تر بەکاردەبرێت.

**حەیزەرانی ڕەمبی:** جیلی ڕەمبی، تەرکەزی ڕەمبی. (لوو.) تەرکەز. جوورەدارێکی نەرمی قەفقەفە وەک قامیشی بەڵام ئەم پتەوە.

**حەیشە (ئەردە.):** حەیچە.

**حەیشە حەیش:** حەیچەحەیچەی یەک لەدووای یەکتریێ.

**حەیشۆ:** شەرم. ـــ ی لێ هەڵگیراوە: شەرمی لێ هەڵگیراوە.

**حەیف (باک.):** تۆڵە. ـــ استاند: تۆڵەی خۆی کردەوە. پەرۆش، سود، سووێ، پەکوو، داخەکەم وای، درێغ، موخابن، داخ. ـــ امن لێ تێ: پێم حەیفە. ـــ هەلانین: تۆڵەکردنەوە.

**حەیفێ:** حەیف.

**حەینە:** ووس.

**حەیوا (فە.):** بێ، بەهێ بەری دارێکییە.

**حەیوە (لو.):** بێ، بەهێ.

**حپ:** مرازی سەرسووڕمانێیە، کاتێکی لاقی مرۆی، کە لە قوڕێ دەکەوێ دەڵێن ـــ.

**حچ (باک.):** هێز، تین.

**حرپ:** حرحرپ، تێکسرماو و قەڵەو. بۆ پیاوی قەڵەو دەڵێن: حرپۆ. بۆ ژنی قەڵەو دەڵێن: حرپێ.

حرچ

**حرچ (لو.):** وورچ.

**حرحپ:** بروانە: حرحرپ.

**حرحر (زا.):** لاسایی دەنگی ئەسپ. (باک.) قاقای پێکەنینێ.

**حرحرپ:** حرپ.

**حرکەحرک (کە.):** حیلکە حیلک پێکەنینی بێجێ وبێ وەخت. (کە.) حرمە حرم.

**حرماندن:** لووش لووشکردن.

**حرمە حرم (دەر.):** لووشەلووش. (کە.) حرکەحرکە، حیلکە حیلکە. پێکەنینی بێ جێ وبێ کات.

**حسکە:** جۆرە تفەنگێکە بەدەست دروست بکرێ.

**حشک(زا.):** ووشک.

**حل:** حێل.

**حلەلاوی:** جوورە مەقامێکی مۆسیقییە.

**حلحایی:** گۆرانییەکە منداڵان بەدەم جوورە یارییەکەوە دەیڵێن.

**حل کردن:** پەسندکردن و بایەخ پێدان. ئەگەر تۆگزی بکەیت لەم کایەدا من حەلی ناکەم.

**حل و گوڵ (ئەردە.):** بیرەوەری.

**حلێب:** حەل، پەسند، حیساب، ئەم کارە حلێبە یا حلێب نیە.

**حلێرک(باد.):** لووی ناوگۆشتییە.

**حلێو:** حلێب.

**حمیرحمیرۆکە (شا.):** گیایەکە.

**حنە (باک.):** خەنە.

**حنچک**: کوت، حێنچک، حینکە، ژەنین، خۆپێوەنان، وەبەرحینچکان دان، کوت پێوەدان. (ڕەوا.) حەنگ، دانە بەر ــ ان.

**حندرحۆ**: گەمەیەکی منداڵانەیە، نیوە ڕاستی دارێکی درێژولەسەر دارێکی ترادادەنرێت منداڵان سوواری هەردووک سەری دارەکەی سەرەوە دەبن بەنۆبە لایەکی بڵندو ئەویتری نزم دەبێ، (هەو.) هەڵاندۆش. (وان.) حێلە زووک. (بار.) شلووک.

**حنگل** (لو.): سنجووقین.

**حنێ** (باک.): ناوی بەستە یەکی کرمانجییە.

**حۆتەوانە** (هەورا.): حەوتەوانان.

**حۆتەی ویەردە** (هەورا.): هەفتەی ڕابردوو.

**حۆت** (هەورا.): حەوت.

**حۆپە** (کە.، هەو.): زەبەلاح، ناقۆڵا، مرۆی قەڵەو و زل و خاو، چتی زل ونالەبار.

**حۆپلە**: مرۆ یا وولاخ و ئاژاڵ یاچتێکی زۆر زل و گەورە و ناقۆڵایە. (باد.) حۆپلەر. (کە.) حۆپە. حۆپن.

**حۆپلەر**: حۆپلە.

**حۆپن**: زەبەللاح، حۆپە، درێژوناقۆڵا.

**حۆحانە**: گەمەیەکی ئافرەتانە.

**حۆرەو**: گوڵاو.

**حۆتە** (هەورا.): حەفتە، هەفتە. ــ یی: حەفتەیی، هەفتەیی.

**حۆیل**: غوول. حوولی بیابان، غوولی بیابان.

**حۆلە** (ڕۆژ.): دەنگێکە بۆ ئاژۆتنی ڕەشەوولاخان بەکاردەبرێت، وەحە.

**حۆڤک**: (باک.) قۆمک. شوورێنی گەپ و گەمە و گاڵتەیە، گەمەگا، یاریگا.

**حۆلبوون**: سەرسام بوون، گێژبوون.

**حۆلک** (شکا.): کەپر.

**حۆلگێل**: گێل و وێل.*

**حۆلی** (مەک.): گێلی، هەوری، تۆلازی، سەرسامی. (باد.) نهۆمی هەرسەرەوەی خانووانە.

**حۆلی بیابان**: غوولی بیابان، گۆیا دێوێکە لە ڕێگایاندا خۆی لە ڕێبووار دەگۆڕێ و سوواری دەبێ.

**حۆوحە**: دەنگێکە بۆ گێڕانەوەی وولاخ و ڕەشەوولاخان بەکاردەبرێت.

**حوبێ** (هەورا.): بزن مژە.

**حودوود**: ئەسپی ــ : واتە ئەسپی ڕەسەن و هەرەباش.

**حورووس**: خێڵێکی کوردانە سێ هەزار ماڵ پترە لە دەوروبەری شاری ماکۆیە و تا سەڵماسیان داگیر کردووە. ڕووس، عورووس، نەتەوەیەکی بێگانە و زۆر بەناوبانگە.

**حورووسی**: زمانی ڕووسی.

**حوزەیران**: مانگی شەشەمی ساڵی ڕۆژی، کە لەنێوانی مایس و تەمووزێ دایە.

**حوژە**: گیایەکی کوێستانییە کۆلکەکەی بنی دەبێتە ئەسپۆن.

**حوشتر**: گیاندارێکی چوارپێی تووکنی پێ پانی لاق و مل درێژی بەهێز و باربەرە. ووشتر، هوشتر.

حوشتر

**حوشترالووک**: ووشترخۆرە، حوشترخووار.

**حوشترالیک**: ووشترخۆرە، پنجەگیایەکە، کە ووشک بوو دەبێتە دڕوو ووشتر دەیخوات.

**حوشترانە قوڵقوڵێ**: جوورە گەمەیەکی منداڵانە لەکاتی کردنیا ئەم ووتارەی بەدەمەوە دەڵێن.

**حوشترە**: تەختەی پانە لەنێو کەرەستەی جەنجەڕیدایە.

**حوشترەوان**: ووشترەوان.

**حوشترخۆرە**: حوشترخووارە، جوورە گیایەکی دڕکاوییە ووشتر دەیخوا لەنێو چوارچێوەی داریشی دەگرن بەپێش پەنجەرانیەوەی هەڵدەواسن هاوینان ئاوی پێدادەکەن بۆ فێنکی.

**حوشترخووارە**: جوورە گیایەکی گەرمێنییە دڕکاوییە ووشتر دەیخوا.

**حوشتردانە**: جوورە گەنمێکی دەنک گەورەترە لە هەموو گەنمێکی تر.

**حوشتروان**: ووشترەوان، کەسێکە ووشتران بەخێوبکات یا بیان ئاژووێ یا بیان لەوەڕێنێ.

**حوشترگەروو**: چەند گونجێکە سەربەرەوژوور لەسەریەک دادەنرێن لە گونجکاریدا بۆ بەرزبوونەوەی ئاو لەو ئەندازەیەی، کە ڕاکێشراوە.

**حوشترمورغ**: باڵندەیەکی گەرمێنی گەورەی مل درێژە وەووشتری دەچێ.

**حووشتری خووا** (باد.): (کۆ.) باڵووکە. (هەورا.) جۆڵاکەرە. فڕندەیێکە وەکوللەی دەچێ.

**حۆقە**: سەنگێکە شتی پێ دەکێشرێ و دووکیلۆیە.

**حۆقەحۆق**: هۆقەهۆق، حیق حیق، حیقەحیق. دەنگی کەر، ئێستر، گامێش یا دەنگی ڕشانەوەیە.

**حۆققە** (ئەردە.): فێڵ و کەڵەکە، فریو، تەڕدەستی، فرت و فێڵ.

**حۆققەباز** (ئەردە.): فێڵباز، کەڵەکەباز. ــ ی: فێڵبازی.

**حۆڵ**: گێژ، وێژ، مرۆی زل و زەبەللاح. سەرسام، حولحولی، حەپۆل، دەبەنگ، گێژە، گەوج، هێڕ، بێ مێشک، گێل، هوڕ، (باک.) تۆلاز، بالە، بۆدل، بۆدلە. خێل. ئەو کەسەیە وورد لە چتی ناگات. (باد.) گوێلکی دووساڵانەیە، کە نێر بێ یا مێ.

**حوڵە**: جوورە گەنمێکە، (هەورا.) ڕەوایی. دەنکی و گوڵی لە هەموو جوورە گەنمێکی تر گەورەترە بۆ ساوار و برێش دەست دەدات. پشکەڵی ووشتر.

**حورمەت** (ع.): ڕێز، پایە، ئابڕوو، ئاوڕوو.

**حولەسێ**: ووشەیەکە لەکاتێکدا بەکاردێنرێ، کە یەکێک قسەیەک یا کردەوەیەکی ناشیرین بکات و لەلایەن یەکێکەوە پێی گوترابێ بە نەکردنی کەچی ئەم هەر بچێتەوە سەری و بیکا لەوکاتیدا پێی دەڵێن چۆوە سەر حوللەسێی خۆی. حوللەمەرەسی.

**حوللەسێ**: حولەسێ.

**حوللەمەرەسێ**: حولەسێ. گەمەیەکە، حەمەرەفرێ، حەچەل، پەیان.

**حۆڵ بوون**: گێژبوون.

**حوڵحەک**: حەلووک، حالووک، حولیچک، هەڵووژە.

**حولحولی:** تـەڕەدین، بـێ مێشـک، سەرسـەری، سـەرچڵ، گێـل، حـۆل، (هەورا.) هەڵشە. مرۆی ڕاڕا.

**حولووربلوور تەکانە:** گەمەیێکی کچانە.

**حولم سێ (دزە.):** گەمەیەکە بـەجگ دەکرێـت و لـەیەکـەوە تـا ٦٠ کـە هەڵیەنەکا دەیباتـەوە بـەلاّن، کە هەڵـەیێکی کرد دەیدۆڕێنی و دەگەڕێتـەوە سەر ٣.

**حولووک (باد.):** هەڵوورژە، هەڵوورچە.

**حولویسک (باد.):** شیلاووک.

**حولوویی (باد.):** لووس.

**حولی (باد.):** لووس، بۆ هەمموو چتێکی دەبێ.

**حولیچەک (باد.):** هەڵوورژە، هەڵوورچە.

**حولیسین (باد.):** هەڵخلیسکان.

**حولیک (باد.):** هەڵوورچە.

**حونەر:** حوننەر، هونەر. ـــ ی: هونەری. کردنی چتی هونەر.

**حونجە:** حینجە.

**حونجەیی:** بڕوانە: حینجە.

**حونجی:** حونجە، حینجە.

**حونـدری:** دارێکـی سـەرتیژە لـەگەمـەی حوندریانـەدا دەیهـاوێن و دەچـەقێ ئەوسا هەرکسـەی بەنۆرە داری خۆیان داوێژن هەرکەسێکی بتوانێ لـە دارەکەی پێشوو بدات و بیخات دەیباتـەوە، بردنەوەکـەش تـەنها لـەسـەر دارەکەیە. (هەمە.) سنجووق.

**حووچ:** بالاّی بەرزی ناشیرین.*

**حووحانە:** جوورە گۆرانییـەکی کچانـە لـەکاتێکیدا دەیلێن، کـە بەرانبـەری یەکتری هەڵئەقونن بەچیچکانەوە.

**حوود:** گلێنەی لێوارشکاو.

**حوول (کە.):** زەردی پرتەقاڵی زۆر پڕ ڕەنگە. (کە.) حوویل.

**حوویل (کە.):** حوول. (لو.) سوور.

**حوویلانێ:** جوورە گۆرانییەکی جافەکییە.

**حـێ:** پیـتی چـاردەمینی ئـابێی کوردییـە. ووشـەیەکە وولاّخـی پـێ لـێ دەخورن.

**حێیـــەتی (بـــاد.):** سەرســـامکار، سەرســـوورهێنەر، سەرســـامی، سەرسوورمان.

**حێج (باک.):** هـارودین (بـۆ ووشـتر و گامێشـان بـەکاردەبرێ، ڕەنگـە بـۆ مرۆڤانیش بەکاربرێ) وەکوو: بارام ـــ بوویە: واتە هارودین بووە.

**حێز:** هێز.

**حێزم (ڕۆژ.، ئۆمەر.):** گیایەکە. مێکووک.

**حێشت (کۆ.):** شەپەلاّخە، زلـلەی پژملێیە. (هەورا.) پژملە. تۆقە.

**حێشتر:** ووشتر.

**حێل:** عێـل، ئێـل، کۆچـەر، خێـلّ. (هـەورا.) هـۆز. بـەرێکی خـڕە وەکـوو دەنکـی پرتـەقاڵی چـەند دانەیـەکی ڕەشـی بۆنخۆشـی تێدایـە لـە وولاّتـی گەرمدا دەبێ. هێل، دارێکی کورتە گوڵی وورد و سپی وەکوو هی پاقلـەی دێنێ پەرەکەی گچکەیە بەقەد گرێی قامکانە تێکوڵـەکەی ڕەنگـی تـەڵخـە دەنکەکانی بۆنخۆشە هەندێ خۆراکی پێ بۆنخۆش دەکەن.

**حێلا:** بڕوانە: حێلا.

**حێلات:** خێلات، حێل، خێڵە سات، کۆچەرات.

**حێللا:** گەمەیەکی ئافرەتانە، حێلانە.

**حێلام:** عێلام.

**حێلانە:** حێلانێ، حێللانێ.

**حێلانێ:** ئەمن و ئەتۆ، حێللا، حێللانە.

**حێلە:** ئیخە، ییخە، حێی. بزنی پێ دەردەکرێ.

**حێلە زووک (وان.):** حندرحۆ.

**حێلجاڕی:** عێلجاڕی، ڕەشبگیر.

**حێلم:** بڕەی مافوور.

**حێنجە:** خوێندنەوەی بەسەر و بۆر و ژێر.

**حێنچک:** ژەنین، خۆ پێوەنان، حینکە، حـەنگ. بـەربۆلای پێش یا پێشی کەسێکی یا لـەنزیکەوە هەڵتەکاندن.

**حێو (کـە.):** حـەو، ئاها، هاها، لـەکاتی گەمـە و فشـە یـا بـێ هیواییـدا بەکاردەبرێ. حێو بەخودا بەیادیشیدا نایەت.

**حێی:** ئێخـە، ییخـە، ئیخخـە، ییخخـە. (کـە.) حێلـە. ووشـەیەکە بزنـی پێدەردەکرێ.

**حیت (زا.):** جوورە بزنێکی ڕەش و موو درێژە. حیتک گچکەکەی وییە.

**حێج (باک.):** شێت، هار، دین.

**حیجران:** کارەسات، ڕووشە.

**حێچ:** گیانداری یاخی.

**حیرس:** تین، ڕق، کین.

**حیرسن:** قیندار، ڕقدار.

**حیز:** ترسەنۆک، نائازا، بێ زات. تەنبەڵ، سست، خاو، سستەپەلە. بێ هونـەر، فسـۆس، نامـەرد، مـەردومی گـەمژی، هیـچ لـەدەست نـەهاتوو. بلّح، پوشت، گاندەر، دۆخێن سست. ژنی حیز، سووزمانی، سووزانی، کاولی، جندە، چپە، خووارۆ، قاحپە، کوزدەر. کوڕی ـــ : قوندەر، کوونی. سووک، قنگدەر. (ژەن.) زۆرەوانی. (باد.) تێڕووچانک. خێڵێکی کوردە لـەچیای ژەنگارێ.

**حیزانە:** کردەوەیەکە، کە هەر لـە حیزان بووەشێتەوە.

**حیزەبەخۆیی:** حیزەبخۆیی.

**حیزەبخۆیی:** گرزی، هەرزەیی، سووکی، پەستی، حیزەبەخۆیی.

**حیزەفێل:** فێڵی حیز و بێ ئابڕووانە.

**حیزەڵ:** حیزەڵە.

**حیزەڵە:** مرۆیەکە هیچ و پووچ و هیچی لـەباردا نەبێ.

**حیزباب:** بابحیز، باوکحیز،باوەحیز.

**حیزبگیر:** کەسێکە بەنامەردی لـەنکاو بگیرێ.

**حیزبگرگێ (ئەردە.):** گەمـەیەکی مندالاّنەیە.

**حیزنای (هەورا.):** بەزاندن. حیزکردن.

**حیزی:** تەنبەڵی، سستی. ترسەنۆکی، نائازایی. گاندەری، بێ شەرمی، بێ ئابڕوویی. حیزێتی.

**حیزێتی:** چونێتی و باری حیزی.

**حیزی حیزان:** نائازای نائازایان. *

**حیزی حیزانگاو:** پەستترین و کەمترین کەس، بۆ کەسێک بەکاردەبرێ، کە لەبەردەستی حیزانیشدا زەبوون بێ.

**حیش** (زا.): زەویەکە خاکەکەی سوور یا شین بێ.

**حیشکە**(باد.): گورگە، گرۆیی ماڵاتان.

**حیشووە:** ناز، لارولەنج.

**حیشووەباز:** دیلباز. ـــ ی: دیلبازی.

**حیشی** (زا.): گوریسی پانی ئەستوور.

**حیفریت:** دێو، دێوەڵووکە، مرۆی کێوی و جانەوەرێکی نەدیتراوە.

**حیلاندن:** کۆڕاندن، هیرین. ـــ ی ئەسپ و ماین: شەهین، شەهین.

**حیلە:** کۆڕان، شەهین، دەنگی وولاّخی بەرزەیە بە جوانووەوە. گۆڕە. فێڵ، فەرەج، تەڵەکە.

**حیلەباز:** فێڵباز. ـــ ی: فێڵبازی.

**حیلەحیلە:** (هەورا.): کۆڕەکۆڕ، گۆڕەگۆڕ. حیلەی یەک لەدووای یەکتری.

**حیلکە:** دەنگی پێکەنین. *

**حیلکەحیلک:** حرکەحرک، حرمەحرم. پێکەنینی بێ جێیە، قاقای پێکەنین، پێکەنینی یەک بەدووای یەکتری بەبێ پسانەوە.

**حیلک و هۆڕ:** حیلکەحیلکی زۆر.

**حیلم:** بەنێکە لە قالی هەڵدەپێچرێ و گرێ دەدرێ و دەقرتێنرێ لەکاتی تەنینیدا.

**حیلنای ئەسپی** (هەورا.): حیلاندنی ئەسپ.

**حیمر حیمرۆکە:** گیایەکی لیچقە.

**حینەوە:** چەنەگە.

**حینە** (ئەردە.): حیلەی وولاّخی بەرزە.

**حینجە:** خوێندنەوەی چت لەگەڵ خوێندنەوەی سەر و بۆر و ژێر.

**حیندرۆ:** گەمەیەکە.

**حینکە:** حێنچک، حەنگ، ژەنین. بەر بۆلای پێش یا پاشەوەی کەسێکی هەڵتەکاندن.

**حینوان:** ناز، نازونیوناز، لارولەنج. هەوا، فیز، تڕزلی. بە ـــ: بەهەوا، فیزدار، تڕزل.

**حینوان دڵ:** بەحینوان، بەهەوا، بەفیز، تڕزل.

**حێوەکێ:** جوورە گەمەیەکی کچانە.

**حێولانە:** حێولانێ، حێلانە. جوورە گەمەیەکە کچان دەستی یەکتری دەگرن و بە گردی هەڵدەپەڕن ـــ ی دەڵێن.

**حێولانێ:** حێولانە.

# خ

**خ:** تیپی پازدەمینی ئابێی کوردییە.

**خا:** خووێ. خاتوون: خاپەروین. هێلکە. کورت کراوەی خانم و خاتوون.

**خابۆر:** خاڵبۆر. (؟).

**خاپ** (باک.): فێڵ، فەرەج، تەفرە.

**خاپاندن** (باک.): فریودان، لەخشتەبردن، قۆڵشکاندن، تەفرەدان، هەڵخەڵەتاندن، هەڵفریواندن، خلاّفاندن.

**خاپەرۆک** (دزە.): پاشەرۆک، بەشێکی خراو و ڕزیوی پووچ و خراپی میوەیە، ووردەی چتێکە کە مابێتەوە.

**خاپخاپۆک**(باک.): باڵندەیێکی چکۆڵەیە.

**خاپرس:** خاڵە پرس (؟).

**خاپۆ:** فێڵباز، تەفرەدەر، فریوباز. *

**خاپۆرە:** خۆڵەپەتانێ کردنی مندالاّنە.

**خاپۆرکێ** (کە.): خەریک بوون، خۆبەچتی بێ کەڵکەوە خەریک کردن.

**خاپۆک** (باک.): تەفرەدەر، فریوباز، فێڵباز.

**خاپوور** (هەورا.، ڕەوا.): وێران، کاوول. ـــ بوون: وێران بوون. ـــ کردن: وێرانکردن، کاوولکردن.

**خاپیان** (باک.): بەفریوچوون، تەفرەخواردن.

**خاپین**(باد.): هەڵخەڵەتان، تەفرەخواردن.

**خاپینۆک** (باک.): فریوباز، فریودەر، فێڵباز، تەفرەدەر.

**خات:** خاتوون، خات پیرۆز. (موک.) یای، خانم، بانوو: خات بەسێ.

**خاتە:** خاتوون.

**خاتەوە:** (شوا.) هێلکەوڕژن.

**خاتر:** خۆشەویستی و گەورەیی یەکێک لەلای یەکێک: فیسارەکەس ـــ ی هەیە لەلات: واتا ڕێزت دەگرێ.

**خاترانە:** بەشێکی پترە کە ئەدرێ بەکڕیارێکی خۆشەویست لە کاتی چت فرۆشتنیدا.

**خاترجەم:** دڵنیا.

**خاترخۆیی:** کردنی کارێک بۆ یەکێک لەبەر خاتری، بوونی یەکێک بەسەر پشک لە کردنی کارێکیدا.

**خاترگرتن:** خاترخۆیی.

**خاترلێکردن:** تکالێکردن لە کەسێکی.

**خاتروخۆتر:** خاترانە، لەبەردڵی ئەم و ئەو.

**خاتۆ** (باک.): خاتوون. ناوی ژنانە. خاتوو: خاتوون، خانم، یای: خاتووبەسێ

**خاتووزین:** نێوی ئافرەتانە.

**خاتوون:** بانوو، یای، خانم، بەلام پتر بۆ کچان بەکاردەبرێت. نێوی ئافرەتانە.

**خاتوونانە:** خانمانە، وەکووشێوە و ئاکاری خانمان.

**خاتوونە** (کۆ.): گیایەکە وەسێوەرەی دەچێ بەلان گەلایەکانی ووردترە.

**خاتێ** (باک.): خاتوون، خاتوونێ، خات، خاتوو، خاتۆ.

**خاجە:** خوواجە بۆ ڕێزگرتن بۆ جوولەکە و فەلان بەکاردەبرێ.

**خاچ:** چەلیپا. چقر. دووچتی ڕاست و چەپە لە زێر یا لە زێر یا لە چتێکی تر درووشمێکی فەلانە. (باک.) ـــ پارێز: خاکپەرست. (باک.) ـــ ی: خاکپەرستی. ـــ پەرس: خاچپەرست. ـــ پەرست: خاچ پەرس، خاکپارێز. ـــ پەرستی: خاکپەرسی، خاکپەرستی، خاکپارێزی.

**خاچخاچۆک** (باک.): خاشخاش.

**خاچرگان** (زا.): سێپای ئاسن.

**خاچۆ:** ناوی پیاوانە، لەخاچ وەرگیراوە.

**خاچی:** وەکوو خاچ، جوورە گوڵێکە وەخاچی دەچێ.

**خاخ:** سەیر.

**خاد:** خاتوون.

**خار** (زا.، شن.، باک.): خووار، لای خووارەوە. (موک.) ئەشکەوت، غار، کوومزەخ. (ئەردە.) لم و قوم، چەگڵ، ووردەبەرد. (هەورا.) غار، ڕا. ـــ دان: غاردان، ڕاکردن. بەـــ: بەغار: کەسێکە یا ئەسپ و چتێکی ترە کە خۆشبەز بێ. دڕوو، دڕک.

**خارا** (موک.): جوورە پارچەیێکی ئاوریشمییە، تافتە. بەردە مەرمەڕ. بەردی ڕەق.

**خارا** (هەورا.): تفەنگی سەرخۆش، جوورە تفەنگێکە. لەوەڕگە، لەوەڕگەی وولاخ و ئاژالانە. (ئەردە.) غارا.

**خاراج** (موک.، هەم.): نرخ، بەها، باج.

**خاران:** خۆشبوونی پێست. پەرخین، خارین (باک.، هەم.) وەرزین.

**خاراندن:** ١) خاوشکاندنی وولاخ و ئەسپێکییە، کە لە مێژ بێ بەهۆی بەفرو بارانی زستانی یا نەخۆشی و ئیترەوە لە تەویلە نەهاتبێتە دەرەوە کە چەند جارێکی بیهێنن و بیبەن و غاری دەن ـــ ی پێدەڵێن. ٢) پێست و چەرم بەخۆشکردنی دەڵێن ـــ. ٣) دیزە و گۆزە و کەل و پەلێکی لە قوڕ دروست دەکرێ دووای سوورکردنەوەیان بە ئاو تێکردنیان ـــ دەڵێن. پەرخاندن.

**خاراو:** خۆشکراو بۆ پێست. بۆ دیزە و گۆزەی سوورکراوەوەش دەڵێن کە ئاویان تێکرابێ. بۆ وولاخی خاوشکایش بەکاردەبرێ.

**خارای** (هەورا.): خاراو.

**خارەسامی** (کۆ.): جوورە هەڵووچەیێکە و مزرە و لایەکی سوورە و لایەکی تریشی زەردە.

**خارچک** (لو.): کارگ، قارچک.

**خارخار:** چتی لەتلەت و برینداد.

**خارخارێن:** غارغارێن.

**خاردان:** غاردان، بەزین، کوتان، هەڵینگدان.

**خارزا** (باک.): خووارزا.

خارخارێن

**خارسک** (زا.): ژنە فەلەیە.

**خارش:** خوورو و خورانی لەش. گرێتی، گڕک، گەرک، خارشت، خورشتی لەشی مرۆ و ئاژاڵ و وولاخانە.

**خارشت:** خارش، ئالۆش، گەرێ. (هەورا.) هالۆش. (ئەردە.) قنگەخرووکە.

**خارکێش:** بەردکێش. کوچک کێش.

خارن

**خارن** (باک.، باد.): خووادن.

**خارنەوە** (باک.): خووادنەوە، (هەورا.) واردنەوە.

**خارنی** (باک.): خوواردنەمەنی، خوواردەمەنی.

**خاروخەسەک:** خاروخاشاک، پووش و پەلاش.

**خارۆزە** (سور.، خۆ.): کرمێکی ڕەشە دووایە دەبێتە باڵدارێکی وەخاڵخاڵۆکەی دەچێ بەلان زەردو نوختەنوختەیە لەبرکەی شووتی و کاڵەک و هاروێ و ترێزوو و ئەسپیندااران دەدا گۆیا بەهەر کەسێکییەوە بدا خەوی گران دەبێ. (هەو.) خەڵۆزە، خاڵۆزە.

**خاررووف** (زا.): گلێنەی دەم پەل.

**خارووفک** (باک.): تەبەکی دار، سینی دار.

**خارووک:** پێلاوی لەگیا چندراو. *

**خاری** (زا.، شن.): خووارێ.

**خاریز:** پرپوڵە، هێلکە و ڕۆن. *

**خارین:** خاران.

**خاریو:** خاراو.

**خاز:** کاردوو. جەغزێکە لەسەر زەوی بکێشرێ. (زا.) هاز. (باک.) گاز. هاز، کاردوو.

**خازەلێ** (موک.، هەو.): خازەلێن. خاجەڕۆ: گەمەیەکی شوانەی لاوانە.

**خازەلێن** (موک.، هەو.): خازەلێ.

**خازخازۆک** (باد.): سووالکەر، لەتەچن، دەرۆزەچن، دەرۆزەکەر.

**خازگین** (باد.): خووازبین.

**خازمێک** (باک.): پووک، پدوو.

**خازۆق** (باک.): هۆرە، جوورە جەزایەکە جاران لە قوونی تاوانباران ڕادەکرا تا دەرەنگ بمرێ.

**خازووق:** خازۆق.

**خاس** (جاف.، هەورا.): باش، چاک، قنج. ـــ بوون: چاک بوون. ـــ کردن: چاک کردن. ـــ بوونەوە: چاک بوونەوە. ـــ بیەیۆ (هەورا.): چاک بوونەوە. ـــ ی: چاکی، باشی. ـــ ێ تۆخانمێ: ـــ خانمی خانمانی. چەشنە گۆرانییەکی موکریانە. (ئەردە.) خاسی کردن: چاکەکردن.

**خاسە** (باک.): جوورە جاوێکە. (ئەردە.) باشی، چاکی، خاسی.

**خاسەڕەنگ:** دەرمانگ. دەرمانێکی سوورە بۆ ڕەنگ کردن و بۆ چارەکردنی هەندێک نەخۆشی بە کاردەبرێ.

**خاسەکی** (ئەردە.): خاسەیی، تایبەتی. کەنیزەک، کارەکەر.

**خاسەووتن** (ئەردە.): پێیەڵکوتن، هەڵنان.

**خاسەیی** (ئەردە.): تایبەتی.

**خاستەر**: خاستر، باشتر.

**خاستەرین**: خاسترین، باشترین.

**خاستر**: خاستەر، باشتر، قنجتر، ئەشیا.

**خاسترین**: باشترین.

**خاسگەل**: چاکان، باشان.

**خاسووک**: هەڵپەرست. کەسێکە خۆی لەشوێنێنی بەترس دوور بخاتەوە.

**خاش** (باک.): خاش، وەکوو جەوالێیە بەلاّم کەمێک زراوترە لەخوری و مووی دروست دەکەن. وورد، هاڕڕا و بەلاّن لەگەڵ ووردی نەبێ بەکارنابرێ: ووردوخاش. (هە.) قاش.

**خاشاڵ** (ئەردە.): خاشە. خۆڵ و خاشی ناومالّ، خەوش و خالّی ناومالّ.

**خاشە**: چرنووکێکەکە برینداریت بکا. — ی لێ هێنا: چرنووکێکی لێدا. خاشاڵ.

**خاشخاش**: تۆوی گیای خەرتەلەیە. جوورە پاوانەیەکی ژنانەیە. گوڵە خاڵخاش، خورماچیچان، چارەچەقیلە، گیایەکە گوڵێکی سوور دەگرێ، تریاکی لێ دروست دەکرێ.

**خاشخاشک**: گوڵی خاشخاشییە.

**خاشۆ** (باک.): نێوی مرۆڤانە.

**خاشیک** (باک.): جوورە هەرزنێکە.

**خاشیل** (زا.): چێشتێکە لەبرۆێش کە ڕۆنی بکرێ بەسەرا.

**خافۆ**: کەنار، قەراغ و لێواری چتی.

**خاڤ** (باک.): خاو، سست، چشتی خاو، کار و مرۆی خاو، نەگەیو، نەکولاّو. خەو.

**خاڤەدان**: چێشتێکەلە دان و گۆشت دروستدەکرێ.

**خاڤر** (باک.): گیایە کە ڕەگی زۆر باشە بۆ مایەسیری.

**خاڤک** (باک.): پێچە، ڕووبەند. کالاّی دڕاوی ڕزیو. (باک.) خاڵگە، کەلەکە، مووسڵدان.

**خاڤی** (باک.): خاوی، سستی. ڕاز: — ی کرن: ڕاز شاردنەوە.

**خاک**: گڵ، خۆڵ، ئاخ، گڵ، ڕزوێ، بەژیا. — بەسەر: خۆڵ بەسەر. نیشتمان، زێد، یەکێکە لەچووار هۆیەکانی سرشت.

**خاکە**: ووردەی قەندی. ووردەی برنجییە. ووردەی خەڵووزییە. (هەورا.) مێشوولەی وورده. — بان(هەورا.): گڵەبان.

**خاکەچەرمگە**: گڵە سپییەکە لەجیاتی گێچی ناومالّیان پێ سپی دەکردەوە

**خاکەرۆ** (هەورا.، کە.): پاشەرۆک. (کە.، هەر.) — ی خەرمان: ماڵینەوەی بنخەرمان، کۆکردنەوەی بنخەرمانە لەپاش هەڵگرتنی خەرمان.

**خاکەرۆک**: خاکەرۆ.

**خاکەسار**: چارەڕەش، خەمناک، ڕەنگی خاک، خاکسار. (ئەردە.) بەندە، فەرمانبەر. — ی: چارەڕەشی، خەمناکی، خاکساری.

**خاکەشارکێن** (ئەردە.): خاکبازی.

**خاکەلێوە**: ئاخەلێوە، نەورۆز، هەوەڵ مانگی بەهارییە، (باک.) ئاخلیڤ، ئادار، مارتە (٣١) ڕۆژە. سەرەتای بەهارەکە لەوەڕ تازە سەردەردێنێ کە چوارپێ دەمی بۆ بیات دەمی خۆڵاوی دەبێ چونکوو گیایەکە زۆر بەرز نەبۆتەوە.

**خاکە ناز**: خاکەنداز، ئاسنێکی دم پانی کلک دارینە و درێژە کشتوکاڵ و قورکاری پێدەکرێ. (هەورا.) بێڵ.

**خاکەنداز**: خاکەناز، بێڵی ئاسن، مەسێ، هەستیڤ. هەستیو. کووانی کێش، ئاگرێش، مەندوونە. — ی تەندووری. (هەو.) بێڵ.

**خاک باز**: کەسێکە بەهۆی خۆڵی ووردەوە گەمە بکات. — ی: چتێکی لە نێوخۆڵێدا شاردنەوە و یەکێکی تر بیدۆزێتەوە. — ی: گەمەکردن بە خاک، خاکشارکێ، تەپەشارکێ.

**خاک بەتوورەکەکێشان**: مەبەس لە وێران و کاولکردنی چتێک یا شوێنێک.

**خاکبەسەر**: خەمناک، پەرێشان، بەدبەخت، لێقەوماو. — ی: خەمناکی، پەرێشانی، بەدبەختی، لێقەوماوی، چارەڕەشێتی.

**خاکبۆس**: کڕنۆشبەر. — ی: کڕنۆش.

**خاکبێژ**: لەوحێکی کون کونە خۆڵی پێ دەبێژرێ وەکوو کەوو سەرەند، خاکپێژ لە چینکۆ دروستدەکرێ، بێژەن.

**خاکپا**: خاکی بەری پێ.

**خاکپەرست**: نیشتمان پەرست. — ی: نیشتمان پەرستی.

**خاکپەروەر**: نیشتمان پەرست. — ی: نیشتمان پەرستی.

**خاکپێژ**: خاکبێژ، چتێکی کون کونە خۆڵی پێ دەبێژرێ لە چینکۆ وەکوو بێژنگ و سەرەند. — ی: خاکبێژی.

**خاکرن** (ئەردە.): ماڵەدانی زەوییە دووای کێلاّنی.

**خاکری** (لو.): خۆڵەمێش.

**خاکرێز**: دەرگایەکە لە دیوی ژوورەوە خڕ داخرابێ و خۆڵیشی وەپشت بدرێ تا نەکرێتەوە.

**خاکسار**: بریتییە لە مەردومی هەژاری بێ نەوا. — ی: هەژاری و بێ نەوایی.

**خاکسەری** (ئەردە.): بۆر، ڕەنگی بۆر.

**خاکسفت** (ئەردە.): جۆرە خۆڵێکە بۆ دیزە و گۆزە و لەویش باشتر کەبۆ ئامانانی چینی دەست بدات.

**خاکشیر**: گیایەکی بەهاری بالاّبەرزە تۆوێکی هەیە وەک تۆوی توتن لەگەڵ شیری کچان تێکەڵ دەکرێ بۆ فێنکی دەدرێ بە منداڵ. کرمی ئاو.

**خاکشین** (باک.): گیایەکە.

**خاککەش** (ئەردە.): عەرەبانەی خۆڵ و زبڵ کێشانی دەستی.

**خاککەفتن**: خۆ خستنە سەر خاک، نێوچاوان لەسەر زەوی دانان، کڕنۆش.

**خاکناز** (ئەردە.): خاکەنداز، بێڵی ئاسن.

**خاکنشین**: خاکسار، گەدا، سواڵکەر، نابووت. — ی: خاکساری.

**خاک و باد** (ئەردە.): هاوخاک.

**خاکوپا:** پەنا و داڵدە، چووەـــ ی: پەنای بۆ برد.

**خاکی** (هەورا.): ڕەنگی گڵی، بۆر، جوورە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی خۆڵی وایە. پارچە (قوماش) ێکە ڕەنگی وەک خاک وایە. (هەو.) زەنگیانە بۆ مرۆڤێکیش بەکاردەبرێ کە بێ هەوا بێ و فیزدارنەبێ و پۆشاکی جووان لەبەر نەکات. ناوی چەندین هەستیاری کوردان بووە و لە مێژووی ویژەی کوردییەکەی بەندەدا هەن.

**خاڵ:** نیشانەیێکە. (هەورا.) لەمیوە پەیدا دەبێ سەرەتای پێگەیشتنی میوەیە. (فە.) نوختە، خاڵ، نتک، نچک، تانە. ـــ کوتان: دەقاندن، دەقدان نوختەیێکی ڕەشکارە لەسەر لەشی مرۆڤان خۆرسکە یا بە ڕەنگ لە ئەندامدا بە دەرزی دەکوترێ. پنک، نیشانگ، پەڵە، نیشانە، تانە، پلک، پەڵەیەکی گچکە، نوختەیەکی ڕەش یا ڕەنگێکی لەکەیە لەسەر ڕوو یا بەسەر جێگایەکی تری لەشەوە. بێ ـــ: باپێڤان. خوواڵ، هاڵۆ، لالە، برای دایک، لال، خاڵۆ، خاڵوو، (هەورا.) لالـۆ. ڕەشانگێکە لەبەفری کوێستاناندا پەیدا بێ واتا کەمکەمە پەڵەپەڵە تووابێتەوە و زەوی کەمکەمە دەرکەوێ، خاڵخاڵی کوێستانان.

**خاڵانە:** وەکوو خاڵان، ووتەیێکە بە یەکێک دەکوترێ لە کاتێکدا کە کارێک یا قسەیێک بکات و ئەو کار و قسەیە یەکێکی تر کردبێتی و تۆ پێت ناخۆشبووبێ، بەیەکێک دەڵێن کە بڵێ مـن ناخووینم (خاڵانـە) ی فیسارە کەستە کە ئەویش وادەڵێ واتە تۆش وەکوو وی وای هەردووکتان خراپ دەکەن

**خاڵانی برێـتی:** چەند نوختەیێکی وەکوو (.....)، لەجیاتی چەند ووشەیەکی دادەنرێ لەبەر ئاشکرایی یا چتێکی تر نەنووسرێن.

**خاڵە:** برای دایک، (هەورا.) خاڵی ڕوو. لە کاتی ئاخۆتن یا بانگکردنێدا بۆ برای دایک بە کاردەبرێ.

**خاڵەبەڵەک** (موک.): ڕەشانگ کە بەفر لە هێندێک شوێنان دەچێتەوە بە و شووێنەی کە ڕەشانگی تێدەکەوێ ـــ ی پێدەڵێن.

**خاڵەپرس:** خاپرس (؟)، نیشانەیێکە بۆ پرسیار لە دووای ووشە یا ڕستەی پرسیارێ دادەنرێ.

**خاڵەڕەش:** (کۆ.) بارێزە، بەرەزا، (زرا.) خەزەرۆک، (موک.، بابا.) قەیتەران، گیایەکە لە نساران و کەنار ئاوان شین دەبێ لاسکی ڕەش و باریکە، لەسەر هەر کولکێکی بە کوتراوی دانرێ دەیکاتەوە و دەری دەکات. کە بشکرێتەچا بدرێ بە و کەسەی کە میزی گیراوە دەیکاتەوە. نێوی کانییەکیشە لەنێوگەلی عەلی بەگی لە ڕۆژاوای ڕەواندزێدا لەڕووی ئەوەوە کە گیای خاڵە ڕەشەی زۆرە بۆیە بەو ناوە ناو براوە.

**خاڵەڕەشە:** گیایەکی کوێستانییە گەڵایەکانی وەکوو کەرەووزی وایە لاسکێکی باریکی ڕەشی هەیە لەکەنار ئاوان شین دەبێ، پەلی سیاوەشان، قەیتەران، ساقی درێژە و ڕەش و باریک و ڕەقە بۆ زۆر نەخۆشیان بە دەرمان بەکار دەبرێ.

**خاڵەزا:** خاڵۆزا، لالۆزا، پسخاڵ.

**خاڵەسۆسکە:** خاڵەسووسکە.

**خاڵەسووسکە:** ژنی کورتە باڵا و قوڵەبنە.

**خاڵە واق:** خاوات..!.

**خاڵتا** (باک.): بڕوانە: خاڵدا، نیشانەی سەرسوڕمان و واق ووڕمانە.

**خاڵبەندی:** دانانی چەند خاڵ و نیشانەیێکە لەنێوانی نووسراواندا دادەنرێ بۆ جیاکردنەوەی ڕستەیەک لەڕستەیێک و یا ووشەیێکی لە ووشەیێکی تر

**خاڵخاڵ:** پنک پنک، نوختەنوختە، گوڵگوڵ، پنتک پنتک. پەڵەپەڵە، قاتقات، پلپل، جنجر. (باک.) خرخاڵ. نتک نتک.

**خاڵخاڵان:** خاڵخاڵۆکە، گوڵەستێرە.

**خاڵخالک:** سپل، فاتەڕەشە.

**خاڵخاڵۆک:** گیانداریکی گچکەی خاڵدارە.

**خاڵخاڵۆکە:** (خۆ.) فسەگورگ، (کۆ.) پیرێژنۆکە، باڵدارێکی گچکەی ڕەش و سوورە بەقەد مێشێکی دەبێ دوو باڵی گچکەی هەیە کەبەشەو بفرێ وەکوو ئەستێرە دەدرەوشێ، لەناو کوردەواریدا باوە، کە مانگا نەیەتە کەڵ تاکێکی لەو خاڵخاڵۆکانە دەخەنە ناو (ماڵی) ئیتر دێتە کەڵ و گای دەخەنە سەر و ئاووس دەبێ.

**خالدا:** (باک.) خالتا. ناوی خێڵێکی کوردی یەزیدییە ڕەنگە لەڕەچەڵەکی خالدی، هالیدی کوردی کۆن بن کە فەرمانڕەواییان کردووە.

**خاڵدار:** کەسێکە گیان لەبەر یا چتێکە خاڵی هەبێ، پەڵەدار، نیشانەدار، دەقاندی، پنکدار. پنتکدار. نازدار، دڵبەر، نیشانەدار.

**خاڵدارانە:** دڵبەرانە، نازدارانە.

**خاڵداری:** دڵبەری، نازداری.

**خاڵکوت:** کەسێکە خاڵی ئەم و ئەو بکوتێ.

**خاڵکوتان:** دەقاندن، دەقدان.

**خاڵکوتاندن:** خاڵ کوتان بە نووکی دەرزی لەسەر لەشی مرۆڤان.

**خاڵکوتانن:** خاڵکوتاندن.

**خاڵگە:** (کۆ.) تەڵۆک، کەڵەکە، (ڕەوا.) خالی، (هەورا.) هاڵیگا.

**خاڵگووری** (باک.): خاڵت بە قوربانت بێ، خاڵ بەخووارزای خۆی دەڵێ.

**خاڵنوختەی بێ گەرد:** بۆ دڵبەر و نازداران بە کاردەبرێ.

**خاڵۆ:** خاڵ، برای دایک، خاڵە، لەکاتی بانگ کردنێدا.

**خاڵوان:** بەرەی خاڵ.

**خاڵۆزا:** (هەورا.) لالۆزا، (باک.) پسخاڵ، هاڵۆزا، بۆ منداڵانی خاڵ بەکار دەبرێ ساکوڕبێ یا کچ.

**خاڵۆزازا:** منداڵی خاڵۆزا.

**خاڵۆزە** (ڕەوا.، کە.): گیایەکە لەداروبارو مێوان دەئاڵێ بەرەکەیان ووشک دەکات، شۆکە، (خۆ.) خارۆزە، (کۆ.، بابا.) خەڵووزە، نەخۆشییێکە لە بەرک و بەرەکانی دەدات، ڕەشی دەکات. (کۆ.) کرمێکی مەیلە و بۆرە دووایە دەبێتە خاڵخاڵۆکە کە باڵدارێکی پنک پنکە.

**خاڵۆژن:** خووالۆژن، هاڵۆژن، ژنی خاڵ.

**خاڵوو** (لو.): خاڵۆ.

**خاڵ و میل:** خەت و خاڵی نازداران، نەخشی بەسنگ و سەرباڵی کەو، ناوتووێل.

**خاڵ و میل ڕشتن:** خاڵکوتانی ژنانە لەسەر ڕوومەت و چەنەگە و گەردنیان، مەبەس لەخۆ جووان کردنی ژنانە. دەرکەوتنی خاڵ و میلی کەوەڵەکاتی گەورەبوونیدا.

**خاڵی:** مافووره، قالّی. (رۆژ.) قالّی، مافووره، (باک.) خالی. (ڕەوا.) خالّگە. بەتاڵ، چۆڵ، حەتاڵ، ــ کردن: ڕەوارتن، چۆڵکردن.

**خاڵیچە** (باک.): قالّیچە، مافووره.

**خاڵیگا** (ئەردە.): خالّگە.

**خاڵی و خووالا:** بەتاڵ و حەتاڵ، (ئەردە.) چۆل و هۆل.

**خاڵیگە** (بابا.): کەلەکە، خالّکە.

**خام:** خاو، سست بۆ (مرۆڤان)، خاویلکە. (موک.) خاسە، جاو، (باک.) جانک. چنراوێکی لۆکەیی سپییە لە جاو سفتترە. نەکولاو، پوخت نەبوو، ناپوختە، کاڵ. (باک.) خاو، بۆ هەموو چتێکی دەست لێنەدراو دەبێ، بندار، کچێنی دار، پێستی خۆشنەکراو، بانەدراو، بەن یا دەزووێکە گرژنەبێ. نەگەیشتوو بۆ میوە و تەڕەکاری.

**خامە:** پێنووس، قەڵەم. (ئەردە.) سەرتوو، سەرشیر، توورژگ. خاو، بانەدراو.

خامە

**خامەبڕ:** قەڵەمبڕ.

**خامەک** (هەورا.): قەنەووز، کرێکی ئاوریشمییە و یەکڕەنگە و تەنکە.

**خامەکی:** چتێکە کەڕەنگی وەکوو ڕەنگی خامەکی وابێ.

**خامەگرێ:** شلەگرێ.

**خامۆش:** بێ دەنگ، کپ، خەفە، ئارام.

**خامووش:** خامۆش، بێ دەنگ، کوژاوەوە، کوژیاگەوە (چرا و ئیتر).

**خامۆش بوون:** بێدەنگ بوون، تەمرین، کوژانەوە، خەفەبوون.

**خامۆشکردن:** تەمراندن، کوژاندنەوە، خەفەکردن، کپ کردن.

**خامۆشگا:** خەفەخانە.

**خامۆشی:** بێدەنگی.

**خامووغ** (زا.): یەکەمین ئاودانی زەوی دا چێنراوە.

خامینە

**خامی:** خاوی.

**خامینە** (هەورا.): کاڵە. (هەورا.) ــ و پاتاو: کاڵە و پێتاو.

**خامینێ** (هەورا.): کاڵە، پێڵاوی چەرمین.

**خان:** نازناوی گەورانە: پاییزخان، نادرخان، گوڵچین خان، ــ ی تفەنگ: ئەنباری تفەنگ. خانوو، نیشتگە، شووێن، میوانخانە، کاروانسەرا، نەخۆشخانە. (لو.، فە.، لک.) شا، پادشا، (هەورا.) سان، میر، خان بە قۆڵکێشانی تووژمالان دادەنرێ و لێدەخرێ کە خۆشی یەکێکە لە تووژمالان. چەند دووکانێکە لە نێو حەوشێکیدا بازرگانییان تێدا دەکرێ، خانووێکە چەندین ژووری تێدا بێ کە کەر و وولاخی تێدەکرێ.

**خانانە:** شایانە، شاهانە، میرانە.

**خاناوەل:** نێوی پیاوانە.

**خانە** (لو.): ماڵ، جۆلایی هەندێ چت، جێ لە ئەژمارێدا، لە خانەی یەکەمدا جێگای ۱ یەکە، لە خانەی دووەمدا ۱۰ دەیە، لە خانەی سێیەمدا ۱۰۰ سەدە و لە خانەی چوارەمدا ۱۰۰۰ هەزارە. هەندێ چت دوو یا دە یا ۱۰۰ خانەیە واتە خانەخانەیە. کون، دەلاقە، چاوە.

**خانەبگیر:** گرتنی یەکێک و بەردەست کردنی لەخانووی خۆیدا.

**خانەبێزار:** کەسێکە لە ماڵی خۆی بێزاربێ. ــ ی: لەماڵی خۆ بێزاربوون.

**خانەتۆرە:** خانووچکەی منداڵان.

**خانەتوولایی:** خانووچکە، گەمەیەکی منداڵانەیە.

**خانەخانە:** نینەنینە، نینی نینی، لە کاتی مریشک دا کردنێدا بەکاردەبرێ.

**خانەخراپ:** ماڵ خراو.

**خانەخراپی:** خانە خراوی.

**خانەخووە** (باک.): خانەخوێ.

**خانەخووەیی:** خانەخوێیی.

**خانەخوێ:** خانەخووە، میواندار، خووێنەخوێ، مازووڤان، خاوەندماڵ، خانەخوێک.

**خانەخووێیی:** خانە خووەیی.

**خانەدان:** خانزاد، گەورەماڵ، بنەماڵ، تۆرن، کابۆش، هیر، کەسێکە لە بنەماڵەییێکی گەورەی دیار بێ. ــ ی: تۆرنی، کابۆشی، خانەدانی.

**خانەزا:** وولاخ یا چوار پێیەکە لە ماڵی خاوەنیدا زابێ و گەورە بوو بێ، خانەزاد.

**خانەزاد:** خانەدان، گەورەماڵ، خانزاد، تۆرن، کابۆش.

**خانەزادی:** خانەدانی.

**خانەزاو:** خانەزا.

**خانەشاری:** دەست بەسەر.

**خانەقا:** خانووێکی تایبەتییە یادی خودای تێدا دەکرێ، شووێن گوزەرانی شێخ و جێ نشینەکانی نەخشبەندیانە. خانگا، خانگاه، لەنگەر.

**خانەقین:** خان نشین. ناوی شارێکی کوردانە لە کوردستانی شارەزوورێدا.

**خانەکولانە:** ووتەییێکە بۆ چوونەوە و دا کردنەوەی مریشکان بە کاردەبرێ بۆ کولانەکەی خۆیان، (موک.) تی تی تی تی.

**خانەکی** (هەورا.): کەوی، لینی، گیانداری ماڵی.

**خانەگا:** خانەقا.

**خانەگومان:** مەبەس لە مرۆیەکی بەد گومان و دڵپیسە، دڵچەپەڵ، بەدگومان.

**خانەنشین:** (باک.) دێمانی، کەسێکە هەمیشە لە ماڵەوە بێ و دەرنەچێ، لە کاردوور خراوەوە.

**خانەوادە:** بنەماڵە، بندار، مرۆڤانی، (باک.) پەرگال، خانەدان، خانەزا، خانزاد. خێزان، زار و زێخ.

**خانەوادەیی:** (باک.) بنداری.

**خانەوخان:** لە بانێکەوە بۆ بانێکی تر بازدان.

**خانەیی** (فە.): خانەکی، ماڵی، کەوی.

**خانەی زین:** ئەو شووێنەیە لە زین کە سووار لە سەری دادەنیشێ.

**خانچی:** کاروانسەرادار، دالاندار، کەسێکە سەر پەرشتێتی خانێ بکات.

**خانچێتی:** کاروانسەراداری، دالانداری.

**خانخانە:** خانەخانە، چاوەچاوە.

**خانخانەکێ** (ئەردە.): پاشا پاشاکێی منداڵانە، میرمیرێن.

**خانەدووق** (زا.): بنکی گیایەکییە دەخورێ.

**خانزاد**: خانەدان، گەورەماڵ، بنەماڵ. نێوی ئافرەتانە.

**خانک**: خانوو. (باک.) پنە. (زا.) زەمبیل.

**خانکێ** (باک.): خانی کچکەیە، لە (خان) وەرگیراوە.

**خانگ**: خانوو، جێگای حاوانەوە.

**خانم**: یای، بانوو، خات، یایە، ناوی ژنانە.

**خانمانە**: یایانە، بانووانە، خاتانە.

**خانمی** (ئەردە.): لەرزانە، دەرزی لەرزانە، گوڵی ڕەنگاوڕەنگ ژنان بەسەر و ئێخەی خۆیانی دا دەکەن.

**خانمێ**: هەر بەو واتا خانمە لە کاتی ئاخەفتنێدا بە — دەدوێنرێ.

**خاننک** (باد.): پنە.

**خانۆک** (باک.): جێگای تەنگەبەر، تەنگە، دۆڵ، دەرە.

**خانوو**: (هەو.) خانی. (باک.) خینیک. (هەورا.) یانە. (دەر.) قۆغەڵ خانووبەرە.

**خانووانە**: کرێ و باجی خانوو.

**خانووبەرە**: خانوو، خانی، یانە، خانووی گەورە.

**خانووت** (گەر.، بار.): جۆلایی. کری جۆلایی.

**خانووچکە**: کۆخ، کۆخک، خانیلە، خانەتۆرە، کۆزلاخ، خانووی چکوولە، مالک، خانیلە، (ڕەوا.) خانەتولابی، شافر. — ی منداڵان.

**خانوومان**: خانم و خاتوون، شۆخ و شەنگ، ناسک و نازدار، خانەدان. بێ — : بێ ماڵ و بێ کەس. (ئەردە.) خانەدان، خێڵ، هۆز، قەڵەو، گۆشتن.

**خانی**: گەورەیی، مەزنی.

**خانێ** (باک.): نێوی ئافرەتانە، بۆ ڕێزوشان لێنانیش بە کاردەبرێ بۆ ئافرەتان. خانوو، خانە، یانە. ئەحمەدی خانی هەستیار زۆر بەرز و کورد و کوردستان پەرستێکی بێ هاوتا بووە لەسەر دەمی خۆیدا ناو و ناوبانگی بەرزی خانی لە مێژووی کوردیدا جێگایەکی زۆر بڵند و بایەخداری هەیە، کاتێکی ئەو هەستی کوردایەتی و نیشتمان پەرستێتی بڵاو دەکردەوە و بانگی کوردانی دەکرد کە پشتی یەکتری بگرن و نۆکەری شەرمە ئەو دەمی نەتەوەی فەرانسە بە کێردی زگی یەکتریان دەدڕی و لە کەنیشتە و دێر و کلیسایاندا ئاکاری دڕندانەیان دەکرد بەڵام موخابن کە نەتەوەی کورد ووشیار و ئاگادار نەبوو نرخی ئامۆژگاری خانییان نەزانی. خانی لە هۆزی خانیەکانی بۆتانییە لە ١٠٦١ ی کۆچیدا لەدایک بووە و لە ١١٢٥ یکۆچیدا لە بایەزیدێدا کۆچی دوایی کردووە.

**خانیلە**: خانووچکە.

**خاو**: گیایەکی بۆنخۆشە وەکەرەوزی دەچێ لە چیایان و جێگایانی تووش و سەخت پەیدا دەبێ کە مەشکە بۆ گەن بێ ئەو گیایەی تێ دەکەن بۆنی خۆشدەکات. سست، تەمبەڵ، فش، فل، بەقوونەقوون، بێ قوون و هونەر و درژ. بە — کەوتن: ناسازییێکە لە دووای ماندوو بوونێ پەیدا دەبێ. خاف، خام، تازی، نەکولاو، کاڵ. بەنی — ، دەزووی خاو: بەن و دەنزووی بانەدراو، پووخ، هۆف، کەکرژ نەبێ. (هەورا.) خەو، خەف، نوستن، وەنووز. گۆشتی — : نەکولاو. پێستی — : خۆشنەکراو. خشتی — : کاڵ.

**خاواق**: خاڵەواق: !.

**خاوان**: خەڵەفان بە کارێکەوە، ئازاد بە نووسینەوە خاواوە. خاوەند.

**خاوانە**: بەنێکە کەداترابێ بۆ پۆی پەڕە و چتی دی.

**خاواندن**: خەڵەفاندنی کەسێک بە کارێکەوە، ئەومنداڵە بخاوێنە. خایاندن، کێشان، پێچوون، بەپێیان لە هەولێرەوە تا دەگەیە ڕەوانـدز سێ ڕۆژان دەخایێنێ.

**خاوانن**: تەفرەدان، لە خشتە بردن.

**خاوە** (ئەردە.): دەزووی خاو، دەزگ خاو. لباد یا قاپووتێکی خورینە کە هێشتا نەپەسترابێ. خامە. (هەو.) سەرانەیە کە بەزۆر و بەناڕەوا لەم و لەو دەستێنرێ.

**خاوەپشت** (دزە.): کەمێک لە فرێتەی خاوترە. (موک.) گیایەکە بە تەڕی و ووشکی بۆنی زۆر خۆشە و بۆنی لە مێخەکی خۆشترە نازدار و دڵداران بەسینگی خۆیانییەوە دەکەن بۆ بۆنخۆشی بە مەشکەی بۆگەنی دادەکەن.

**خاوەخاو**: سستە سست، یاوەیاو، ئارام ئارام. تووکی چۆغە و مافوورە.

**خاوەر**: ڕۆژهەڵات.

**خاوەرزان**: خاوەرناس. — ی: خاوەرناسی.

**خاوەرناس**: خاوەرزان، ڕۆژهەڵاتناس. — ی: خاوەرزانی، ڕۆژهەڵاتناسی.

**خاوەشەنە** (شا.): پێستێکی خاوە بۆ شەنەی بەکاردەبرێ.

**خاوەمێ** (شن.): نیوەکوڵ بۆ شیری بەکاردەبرێ.

**خاوەن** (هەورا.): خاوەند.

**خاوەند**: خێو، ماخۆ، ماڵخۆ، ماڵخوێ، خاوەن، خێوی، خودان، (باک.) خووەدی، خووەدێ، خووەی، ئەرباب. بە — : خوداندار، بەخێوی. بێ — : بێ خودان، بێ خێو، بێ سەرە. — ار: خاوەنی شت. — اری: خاوەندی و چاوەدێری. — شکۆ: خاوەن شکۆ. — شکۆیی: خووەدی ڕەووش. — ماڵ: ماڵخۆ، ماڵخێ ماڵ، ماخۆ. — ماڵی: ماخۆیی، ماڵخۆیی. — ی: خێوێتی، خودانی. — یتی: خودانێتی.

**خاوەوبوون دڵ** (ئەردە.): برسێتی، خاوبوونەوەی دڵ.

**خاوەوخێز**: خاووخێزان.

**خاوبوون**: سست و خاوبوون.

**خاوبوونەوە**: جەفلین، سست بوونەوە، نەمانی کرژی چت، سارد بوونەوەی یەکێک لە کارێک.

**خاوپەر**: بە نێکە نە زۆر خاو و نەزۆر کرژبێ.

**خاوخاو** (ژاو.): لارولەنج، ناز و نیمناز.

**خاووخلیچ**: مرۆی سست و خاو، سست پەل، تەنبەڵ، تەپڵەترە، دەستەووستان.

**خاووخلیچک**: بێکار، تەپڵەتر، خاو، شل و شێواو.

**خاووخێزان**: ماڵ و منداڵ بە وورد و درشتییەوە.

**خاوروون** (فە.، مەن.، خا.): هێلکە و ڕۆن.

**خاوزان** (ئەردە.): کەسێکە مەبەستی خەون چاک لێک بداتەوە، لە خەونزان، خەون باش لێکدەرەوە.

**خاووس**: خوواس، رووت، کۆت، پەتی، بەڵام بەتەنهایی بەکارنابرێ بەڵکو لەگەڵ پێ بەکاردەبرێ: پێخاووس.

**خاوشکاندن:** (هەورا.) شان شکاندن، (با.) ئاخاوتن، سەر خەوێک شکاندن. خاوشکاندنی وولاخی دا بەستراو.

**خاووک:** بەنێکی دوولایە بەرە و جەواڵ و تێر و خورج و چتی وای پێ دەچنرێ.

**خاوکەر** (کە.): جۆرە گۆرانییەکی خۆشی کوردییە لە مەقامی ئاللاوەیسی خاوترە.

**خاوکەرەوە:** برێتییە لە سارد کردنەوەی یەکێک لە چتێک.

**خاوکردنەوە:** سست کردنەوە، (هەورا.) خاو کەردە بۆ، (فە.) خامکردن، نەهێشتنی کرژی چت، شل کردنەوەی چتی خەست و پەیت.

**خاوگە:** نوستنگە، ژووری نووستنێیە.

**خاولی:** پشتەماڵ، رووماڵ، پێشتەماڵ، دەرجاو، مەخمەل. تەنراوێکی نەرم و شل و تووکنی لۆکەییە مرۆ خۆی پێ ووشک دەکاتەوە.

**خاولیچ:** سستەپەلە، تەمبەڵ، تەپ لە ووتە و کاردا.

**خاونامە** (ئەردە.): خەوننامە.

**خاوون:** خاوەن.

**خاویر** (ئەردە.): خەواڵوو.

**خاویرە** (دەر.): باڵندەیەکە هێندەی پاسارێکییە بۆرە و تووکی نەرمە و گۆشتیشی دەخورێ.

**خاوین:** پاک، پاگژ، جوەروو، (باد.) زکاک، (باک.) ئاڤیژە، برجەقان، پییک، جنجلی. ـــ بوون: پاک بوون. ـــ کردنەوە: پاک کردنەوە، تووشماڵ کردن، کلاشین، مەردان، داوەراندن، داوەرڤاندن. نێوی ئافرەتانە. نا ـــ : ناپاک، چەپەڵ، پیس. (ئەردە.) خاو بۆ پرچ و چتی وا.

**خاوینەر:** پاکەرەوە، خاوێن کەرەوە، پێشۆر(سابوون).

**خاوینی:** پاکی، پاگژی، نا ـــ : چەپەڵی، پیسی، ناپاکی.

**خاوی:** خاڤی، خامی. بە ـــ : بخاڤی.

**خاویی** (رەوا.): گای بار نەبەر و جەنەگر و خۆبەزەوی دادان.

**خاویر:** گیانداری گێلوویل، (ئەردە.) خەواڵوو.

**خەواڵوو:** چاوبەس، ئەوەی تازە لە خەو هەستابێ و هێشتا خەو بەری نەدابێ.*

**خاویشە** (باک.): دروگەی شیناوەردی، دوورووگە (جزیرە)ی سەوزایی.

**خاویلکە** (هەو.): ساواری نیوەنجییە کە نە زۆر درشت و نە زۆر ووردبێ بۆ کفتە و دۆلمە دەست دەدات، (هەورا.) شەشدانگ.

**خایاندن:** کێشان، خاواندن، پێچوون، پێچوونی کارێک بۆ چەند کات و دەمێک: چوون و هاتنەوەم لە هەمەدان (٦) رۆژی خایاند. رێک کەوتن. تەفرەدان، هەڵخەڵەتاندن.

**خایانن:** خەیاندن، خایاندن، پێچوون.

**خایە** (فە.، مەن.، خانە.، لو.): خا، هێلکە.

**خایەورۆون** (فە.، خا.، مەن.): هێلکەورۆن.

**خایەومایە:** مەبەس لەسەر و ماڵە، ئەریان ـــ ی تێدا چوو: واتە سەرو ماڵی تێدا چوو. دەستمایە و قازانج.

**خەبات:** کۆشەوە، تەقەلا، هەوڵ، (باد.) شەرک، فرمان، کۆشش، هەوڵ و تەقەلادان، کۆشەوە.

**خەباتکار:** کارکەر، بەکۆشش.*

**خەباتکەر:** خەباتۆ. (باک.) کارکەر.

**خەباتکرن:** هەوڵ و تەقەلادان.

**خەباتکوژ:** پەککەر، پەک تێخەر. ـــ ی: پەککەستن.

**خەبار:** بڤە، خەتەر.*

**خەبەر** (زا.، یەز.، باک.): جنێو، جوون.

**خەبەردار** (هەورا.): بێدار. ـــ ی: بێداری.

**خەبتان** (باک.): خەبات کردن.

**خەبتاندن** (باک.): کارو خەبات پێکردن.

**خەبتین:** خەباتکردن، تێکۆشان، هەوڵ و تەقەلادان.

**خەبرۆشک** (باک.): داستان.

**خەبینەت** (باک.): زیان (زەرەر).

**خەپار:** خەپەتۆڵە، بەڵان لەگەڵ خڕ فراق بە کاردەبرێ، منداڵی ... خڕ و خەپارەیە: خەپەتۆڵەیە. (باک.) وەرد، زەوی دووبارە کێلانەوە.

**خەپارتن** (باک.): چینەکردن (بۆ باڵندان)، بخەپرتینە: چینەی بکە.

**خەپانە:** خەپانە. منداڵێکی خڕو پڕ و قەڵەو و ئێسک سووکە، خەپەتۆڵە، تێکسرماوو، قوڵەبنە.

**خەپە:** سینگێکی گچکەی سێ قامک پان و بستێک درێژە، مژانە و هەو جارێ لێک گرێ دەدەن، (خۆ.، هەورا.) هەپە، گەلە. (باک.) زەوی قەلەشتوو. (موک.) شەنەی ددان پان و گەورەی درێژە بۆ کاکێشانێ بەکاردەبرێ و جۆخینیشی پێ هەڵدەدەنەوە.

**خەپراندن** (زا.): خۆشکردنی زەوی بۆ چاندنی.

**خەپەتۆڵە** (موک.): قوڵەبنە، خەپە، خەپانە، خەپەرە، خرکەڵە، منداڵێکە، کە پێی هەڵگرتبێ و خڕو پڕبێ، خەپەتوورە. (رۆژ.) ئەو تووتکە سەگانەیە، کە تازە چاوی تروکا بێ و قەڵەو و خڕو پڕبێ.

**خەپەخەپ:** دەنگی گاگۆڵکێی منداڵانە، دەنگی غاردانی منداڵانە، خلەخل، خرتەخرت.

**خەپەرە:** خەپەتوورە، بۆ منداڵ و فەرخەی ساوا بەکاردەبرێ، کە کەمێک گەورە بووبێ، ساوای قەڵەو. ـــ بوون: قەڵەو بوونی ساوا.

**خەپەرەکردن:** نوستنی هێندێ گیاندار وەک تووتکە سەگ و پشیلە بە گرمۆڵەیی. چینەکردنی باڵندان، بە تاڵووکە خواردن، خەپارتن، بخەپرینە.

**خەپراندن** (باک.): چینە کردنی باڵندان. (زا.) خۆشکردنی زەوی بۆ چاندنی. بەپەلە خواردن.

**خەپکە** (باک.): خەپلە، پەپکەکولێرە، کێتکە نانێکە ئەستوورو پانکراوەوە، فاقەی باڵندان، (باک.) گازوولکە، تۆری راوی. چتێکی درێژە کە هەردووک سەری هاتبێتەوە یەک ئاڵقەی دابێ.

**خەپلە:** کولێرەی نانی، شەواتان، گردە، زۆر تری لە گەنم نییە. کولێرەیەکە لە جۆی دروستدەکرێ. کولێرەی ئەستووری هەورامانە. قۆڵەبنە، خەپەتۆڵە، خەپەرە، خەپانە، بەمرۆی قەڵەو و ئەستوور و قوڵەبنیش دەڵێن. (رۆژ.) ئەو تەختە گۆشتەیە بە دەوری ئەندامی شەرمی ئافرەتانەوە.

**خەپۆ:** فێڵزان، فریوباز، تەفرەدەر.

**خەپوولێ** (ئەردە.): پوولپەرست.

**خەپوولی:** پوولپەرست.

**خەت:** دێغ، خیت، ـــ لێدان: خەتکێشان، دێغ کێشان، ـــ پێداکێشان: پێراهێنان. خێت، دێر، شخت، کێر، خیبیت، خێر، گێڕی سەر کاغەز یا سەر زەوی، ـــ ی نوسین، نوویس، نووسین، بۆ چووم، نووسیاری. سەرەتای ڕیش و سمێڵی کوڕێکییە کە تازە سەری هەڵدابێ. گێڕ، ـــ ی جووتی: هێڵ، (موک.) هێش، دەخەت یەک لاتە، هەڤدلات هۆگانێکە.

**خەتا:** تاوان، سووچ.

**خەتات:** دەرمانێکە بۆ جوانی و ڕەشبوونی لە برۆ دەدرێ. ـــ ی: ڕازانەوە بە خەتات.

**خەتەنە:** خرو و سەبران، گون برین. ـــ کەردەی (هەورا.) خەتەنە کردن، پێستە پترەکەی سەری چووی منداڵان برین.

**خەتەنە سووران:** ئاهەنگ و شادمانێکە کە بە هۆی خەتەنەوە دەگێڕدرێ، خرووسەبران.

**خەتەنەکەردەی** (هەورا.) خەتەنەکردن.

**خەتەنەکردن:** پێستی چوو (جووک)ی کوڕان برین.

**خەتەنەکریاگ** (ئەردە.): خەتەنەکراو.

**خەتخەت:** دێغ دێغ، داغ داغ.

**خەتخەتانێ:** گەمەیەکی منداڵانە، خیت خیتانێ.

**خەتخۆش:** خۆشنووس. ـــ ی: خەتخۆشی: خۆشنووسی.

**خەتدار:** دێغدار، داغدار. ـــ ی: دێغداری.

**خەتدان:** مەبەس لەدەرهاتنی مووی ڕیش و سمێڵییە.

**خەتکەش:** خەتکێش.

**خەتکوژێن:** خەتکوژێنەوە.

**خەتکوژێنەوە:** خەتکوژێن.

**خەتکێش:** پارچە ئاسنێکی پانە یا پارچە دارێکە بزماری لەسەر دراوە هی دارتاشی، ڕاستە، خەتکەش.

**خەت نەتەر** (ئەردە.): خەتێکە جادووگەران لە دەورەی خۆیانی دەکێشن و لە ناویدا خەریکی جادووبازی دەبن.

**خەت و خاڵ:** خەت و میل.

**خەتیرە** (باد.): چۆڵەچرا.

**خەجەرۆ** (هەو.): گەمەیێکی منداڵانەیە.

**خەج وسیامەند:** چیرۆک و بەسەر هاتێکی ناودارە.

**خەجێ:** کورتەی (خەجیجە)یە.

**خەجیجووک** (زا.): گیایەکی گوڵ سوورە.

**خەچخەجیلک** (ئاک.): داعبایەکە وەکوو مارمیلکەی وایە لە ئاویدا دەژێ، نوختەنوختەی زەرد و ڕەش و سپی پێوەیە.

**خەچەدەک:** سێ پایە، سێ پێ، سێ پێی سەر ئاوری.

**خەدەنگ** (ئەردە.): تیر.

**خەر** (فە.): کەر، گوێدرێژ، هەر.

**خەرابە:** وێرانە، کەلاوە.

**خەرڕات:** خەرتگێڕ، دارتاشێکە کە دار خەرت بکاو کاسە و کەوچک و کەمۆڵەی لێ دروست بکات و تەشی و دەفری دارین.

**خەراتی:** پیشەی خەرت گیری، خەرت لێدان، تاشینی کەوچک و کاسە.

**خەراج:** خەرج، باج، باجی میری، میرانە، میری. (باک.) تیرە، هۆز، خێڵ.

**خەرار:** جوورە تەلیسێکە لە بەن دروست دەکرێ، (باک.) خرار، تنراوێکی شاشی زبری مووییینە زۆرترین تووتنی ڕەشۆکی ووردەی تێدەکرێ، پتر لە مووی بزن دروستدەکرێ.

**خەراف** (باک.): ئاعووری ئاوییە کە ووڵاخێک بەدەوریدا دەسووڕێ بەو هۆیەوە چەند سەتڵێک پڕ و چەند سەتڵێکیش بەتاڵ دەبێ.

**خەرڕاک** (هەو.): (باد.) خرەک، لووسکردنی مەڕمەڕان.

**خەرام:** لەنجە، لارە، لارولەنج، شنە، قونە.

**خەرامان:** بەلارولەنجە، ئافرەتی شەنگ و شۆخ، شۆخ. نێوی ئافرەتانە.

**خەرامین:** شینیی، مۆنی، قونەقون.

**خەران** (باک.): خەرەند، کەنداڵ و بەردانی بڵند لە کەنار ئاوان.

**خەرە:** (ڕەوا.) غەرە، دیواری ووشکە کەڵەک، دیوارێکە بە ووشکە بەردان هەڵچنرابێ. (هەورا.) خەرۆ، شادمان.

**خەرڕە** (ئەردە.): بێ هۆش، کاس (هەورا.)، خودسەر، بێ هۆش. (ئەردە.) سەردومی کەڵلەڕەق و بێ گووێ. (باک.) چاوەنوواڕ، چاوەنوواڕی.

**خەرەبەنگ** (ئەردە.): خەرپەنگ.

**خەرەزەن:** قامچێیکی ئەستوورە کەڵ و گامێشی پێ داژۆن.

**خەرەفان:** خەرفانی مرۆڤ لەبەر پیری، هۆش و ژیری تێکچوون.

**خەرەفاو:** کەسێکە لەبەر نەخۆشی یا لەبەر پیری خەرفا بێ، خەرەفیاگ.

**خەرەفیاگ** (ئەردە.): خەرفاو، گەوج.

**خەرەفیان** (ئەردە.): خەرەفان، خەرفین، گەوج بوون.

**خەرەفین:** خەرفان، خەرەفان.

**خەرەک:** (هەو.) چرک، (ڕۆژ.) دووک، چرغ، چتێکی دارینەیە پەڕەیەکی گەورەی هەیە دووخێکی پێوەیە بەدەسکەڵووجە با دەدرێ و لۆکە و خووری پێدەڕێسرێ. لە ـــ دراو: چرکین. لە ـــ دان: چرکاندن، پەروانەیێکی پێوەیە بە دەست با دەدرێ بۆ ڕستنی خووری و لۆکە، (هەورا.) دووخ. خرکێش، کەرکێش، دووچتی دارینە وەکوو سەوەتەیە بەرد و خشتی لە سەر پشتی ووڵاخان پێدەکێشن، بەردکێشی دارین. سێ پایە.

**خەرەکەوان:** چرکەوان، چرکڤان.

**خەرەمە** (ئەردە.): نێرەکەر.

**خەرەن** (ئەردە.): کەڵەک، بەردچن، سەنگ چین.

**خەرەند:** خەران، زەوی و کەنداڵ و بەردی زل و بڵندە لە کەنار ئاواندا.

**خەرەنگەز:** جۆرە مێشێکی زلی سەوزە، مۆز، مێشەکەرانە.

**خەرەنگەزە:** مۆز، مێشەکەرانە.

**خەربەن:** خەربەنگ. (باد.) ئەو کەسەیە داری سووتاندنی بە وولاخی دێنێ بۆ فرۆشتنێ.

**خەربەند:** گیایەکی بەرزە تۆوێکی ووردی هەیە دووکەڵەکەی بۆ ئەندامی قەڵشاو پڕ سوودە.

**خەربەندە:** (ئاک.، ئام.، باد.) کاروانچی، وولاخدار، قەتارچی. (کە.، ئەردە.، هەورا.) گیایەکە لە نێوەغڵیدا شین دەبێ، کە وولاخ بیخوات پێی سەر خۆش و بێهۆش دەبێ، غەربەند، زیوان.

**خەربەنگ:** زیوان، خەربەندە، کزنک فەرەنگی، جوورە گەرچەکێکە، خەربەند دەسووتێنرێ بۆ ئەوەی دووکەڵی بچێت بە ئەندامی قەڵشاوە سوودی لێ دیتراوە.

**خەربزە** (فە.): کاڵەک.

**خەربۆک** (باک.): گرێ.

**خەربۆکی** (باک.): گرێدراو.

**خەربشت:** قووڕ بەردێکە بە بن دیوارێکیدا بنرێ بەڵکوو قایم بێ، بەستن.

**خەربشتە:** کەمەر، کەمەرە، سەربان یا سەر تاق و دەرگا و پەنجەرەیەکە وەکوو گومبەز دروستکرابێ.

**خەرپنگ:** زرپنگ، خەرپونگە، جووری پنگێکە و ناخورێ.

**خەرپونگە:** زرپنگ، گیایەکی بەهارییە و ئاوییە وەکوو پنگی وایە بۆ برینی پشتی وولاخ باشە.

**خەرپێت:** باژارەکی کوردە دکەڤێ رۆژئاڤایێ ئامەد (دیاربەکر)ی ئەمڕۆ لە خەرپێت بازاری (العزیز) دروست و ئاوەدانکراوە.

**خەرت** (باک.): شەکەنێرێکی یەکساڵانەی خەساوە تا دووساڵان ـــی پێدەڵێن، بە کووری خەساویش هەر دەڵێن ـــ. (هەورا.) خرت، مازماز. مەتەوکوان و تیغێکە دارتاش داری پێ خڕ و لووس دەکات. (موک.) جووری کەرەستەیێکی دارتاشییە داری پێ خڕدەکرێ. لە ـــ دران: خەرتین، رزان، خوران. لە ـــ دان: خرتاندن.

**خەرتا:** جوورە شەڵتەیەکی گەورەیە وەکوو رەشکەی.

**خەرتاندن:** رنین، لەخەرتدان، کراندن، لووسکردن، سووانەوە.

**خەرتە** (موک.، باک.): خرتە، زەوییێکی نەکێڵراوە کە گاسنێکی لێ درێ و تۆوی پێوەکرێ و دووایە بیکێڵنەوە، زەوی دووگاسنە، کە واتە دووجار کێڵرابێ. (رۆژ.) جووت، ـــ کردن، جووتکردن.

**خەرتەل** (هەو.): داڵ، داڵاش، قەرتەل.

**خەرتەڵە:** خەردەل، خرتەڵە، خەرداڵە. (کە.) گیایەکی بەهاری و پاییزییە لە کەنار ئاوان شین دەبێ و دەخورێ ئەژنۆیەک بڵند دەبێ گوڵی تۆپێکی بڵاوو زەردە، بەڵان لە پاییزاندا گورمزەی پێدەڵێن و گوڵی شینە. گیایەکی گەڵاپانی بەهارییە وەک گەڵاتوور وایە بەڵام ئەم سەلکی نییەو تامیشی هەر وەتامی تووری دەچی.

**خەرتکەر:** خەرتلێدەر.

**خەرتگێڕ:** خەرتکەر، خەرت لێدەر.

**خەرت لێدەر:** خەرتکەر، خەرتگێڕ.

**خەرتین:** لەخەرتدان، خوران، کران.

**خەرج:** گوزەران، دررەو. (باک.) بەند، بەنداوی ئاوی جۆگە و چۆمانە. (باک.) ماف. باج، خەراج، خاراج، پارەیەکە یا دەغڵێکە لە ژێر دەستان دەستێنرێت، دررەو. گوزەران. (کە.) گولابەتوون، شریت یا قەیتانی ئاوریشمە کە لە سیخمەی کوردی وولاتی کەرکووک و کڵاوی ژنانی موکریان دەخرێت و پێی دەڕازێننەوە.

**خەرجکەر:** دەستبلاو، گوزەرانکەر.

**خەرجکردن:** چوواندن، بەختکردن.

**خەرجی:** رۆژانەی منداڵ و شاگردان، چوواندن، دەرچوون. جوورە بافتەیەکی پانە لە کەناری کەوا وسیخمەی ژنان دەگیرێ.

**خەرچەنگ** (باک.): خرچەنگ.

**خەردار:** دوو داری ئەستوورە (پردەڵە) یان لەسەر رایەڵ دەکرێ و بەردی ژێربەرداشیان لەسەر دادەنرێت.

**خەرداڵ:** باڵندەیێکی گەورەی بۆری گۆشت خۆری کێوییە، کەرخۆرە، پەلەوورێکە.

**خەردەل:** خەرتەڵە، خرتەڵە، گورمزە، گیایەکی خۆرسکی دەشتییە. گیایەکی خۆرسکە، گەڵای وەهی تووری دەچێ و گچکەترە، گوڵی زەردی هەیە، دەنکەکانی وورد و قاوەیین، تامی توندو تیژە، دەنکەکانی وی درواێ کوتانی لە ئاو یا لە سرکەیدا دەکەنە هەویر لەگەڵ خواردنی بۆ جووڵاندنی نیشتیا بەکار دەبرێ، لە پزشکیشدا بۆ شووشتنی پێی نەخۆشان بەکاردەبرێ.

**خەرزا** (باک.): غەرزا، ناوی سەردارێکی کوردە لە راژۆرێ جۆمی (دەجلە.) شارێکی ناوداری خەرزانە. نێوی ئێلێکی کوردە تێکەڵ بە ئێلی شەمەڕی ئارەوان بووە، خرسات، خرزاد.

**خەرز** (زا.): جووتگرتنی گیاندار بێجگە لە ئادەمی. (بابا.) گەرای کوللە و چتی تر.

**خەرزاد:** ناوی سەردارێکی کوردە بە ئێلی خۆیەوە تێکەڵی شەمەڕی عەرەبان بووە.

**خەرزاڵە** (زەن.، کەل.): ژاڵە.

**خەرساندن:** خساندن.

**خەرسانن** (ئەردە.): خساندن.

**خەرسەک:** کوللێرەی ئەستوور و زبر. گڵمەت، گڵمتک، گڵ وگڵ. پارچە جلێکی قورس و ئەستوورە، سیپاڵی ئەستوور.

**خەرسکردن:** قەبلاندنی بەری دارە بۆ لێ دەرکردنی دەیەک.

**خەرک** (ئەردە.): هەرگ، قوڕ.

**خەرکان:** خەرکانە.

**خەرکانە:** کوڵێکێکە لە بناگوێی منداڵان تا تەمەنی شەش ساڵان هەروە چاویلکەی دەچێ ئەگەر لە پێش دەربوونیدا مووروویی داغکراوی پێوەنێن دەی رەوێنێتەوە یا زوو دەری دەکات. هەندێکیش دەڵێن برینێکی بە ئێشی تەڕی پەرە ئەستێنە بە دەم و چاوی منداڵان هەڵدەپەڕێ.

**خەرکاو:** خەریک بەڵان لەگەڵ خەریک بەکار دەبرێ، هەمیشە خەریک و خەرکاوە.

**خەرکەدار** (ئەردە.): وولاخدار، کەردار.

**خەرکەمان:** چتێکە وەکوو چیکەنە کەوەی دەفە و بێژنگ و چتی تری پێ دەچەمێنرێتەوە، خەرکەوان.

**خەرکەما** (شا.): سینگ وشریتێکە سەری شریتەکە لە لاق و دەستی شریتەکە وە سەرەکەی دیکەش لە سینگێکی چەقا و قایم دەکەن پیاوەکە بە هێز ڕادەکێشن تەقەی لێ دێ و دێتەوە جێی خۆی.

**خەرکەوان** (ئەردە): خەرکەمان، مرازێکی گەورە داری خواری پێ ڕاست دەکەنەوە.

خەرکۆڵک

**خەرکۆڵ:** کەرکۆڵ، گیایێکی بەرزی گەڵاپانە گەڵاکەی بە ووشکی دەکوترێ و چتێکی لێ پەیدا دەبێ وەکوو لۆکەکۆن کە لە ناوی کاڵەک هەڵکێشرێ دەبێ بە (قاو) (پوشو) بۆ ئاگر کردنەوە بە کاردێنرێ بە هۆی بەرد و چەخماخە.

**خەرکۆڵک:** کەرەکێوی.

**خەرگ** (فە.): قوڕ، هەرگ.

**خەرگا:** خێوەتی گەورە، بارەگا، خەرگە، چادر.

خەرگۆشە

**خەرگەلە** (باک.): کۆڕ، شوێنی لێ کۆ بوونەوەی خەڵکییە. (باک.) مێگەلێکە هەمیشە لە دەرەوەی ڕا بووێرێ. کۆمەڵگە، جڤات.

**خەرگۆر** (ئەردە.): گۆر، کەرە کێوی.

**خەرگۆشە** (زەن.): کەرویشک، هەوریشە.

خەرگۆلک

**خەرگۆلک** (بابا.): شوور، گاکێوی.

**خەرگووش:** هەوریشە، کەرویشک.

**خەرمان:** کۆمەڵە دەغڵێکی سوورە لەسەر جۆخین شەنە با کرابێ، جێز، ڕەوسە، ڕفسە، بە دەغڵی درواو و کۆمەڵکراویش دەڵێن کە بۆ گێرە ئامادە کرابێ. ـــ کوتان: گێرە کردن، ـــ ماڵینەوە، خاکە ڕۆی خەرمان. بریتییە لە چەند شارایەک و شارا لە چەند مەڵۆیەک و مەڵۆ لە چەند دەستە جۆخین دارەیێک لە گەنم و جۆی درواو کە لە شوێنێ کۆمەڵکرابێ و ئامادەی کوتان و گێرەبێ. کە بۆ جاری یەکەم گێرەی بچێتە سەری بۆ جاری یەکەم پێی دەڵێن: (قرشەکوت). کە بۆ جاری دووەم گێرە بکرێ یا جەنجەڕی لە سەر بگێردرێ پێی دەڵێن: وورده کوت. کە بۆ جاری سێیەم خرکرێتەوە سەر یەکتری و گێرە یا جەنجەڕی لە سەر بگێردرێ پێی دەڵێن: (تارمە). بۆ جاری چووارەم کە شەنە با کراو سوور و خاوێن بۆوە پێی دەڵێن: (ڕەوسە). کە ڕەوسە لەگەڵ سەپانی دا بەشکرا (کۆمەڵ) ی پێ دەڵێن. لە دووای هەڵگرتنی کۆمەڵەکان ئەوەی ماوە (بنخەرمان) ی پێ دەڵێن.

خەرمان

**خەرمانان:** تەباخ، یەرمین، ناوی مانگێکییە، حوزەیران مانگێکە خەرمانی تێدا بەرهەم بێ. کاتی دروێنە و دانانی خەرمان.

**خەرمانە:** ـــ ی گردی مانگ و ڕۆژ: گێرێکە لە هەورێکی تەنک لە دەورەی جۆخینە مانگ یا ڕۆژ پەیدا دەبێ نیشانەی بارانەیە، (هەو.) ئاخ، ئاخڵە، هێڵێکی گردە بە دەورەی مانگدا بە هۆی تەنکە هەورێکەوە پەیدا دەبێ گۆیا بە نیشانەی بارانەی دادەنێن.

**خەرمانسوور** (ئەردە.): خەرمانی سوور.

**خەرمانشەن نەکریاگ** (ئەردە.): خەرمانی شەنە نەکراو.

**خەرمانکوتیاگ** (ئەردە.): خەرمانی کوتراو.

**خەرمانگا:** جێگای خەرمانە، شوێنی خەرمان و جۆخین.

**خەرمانلۆخە:** لەسەر جۆخینێ دەخڵێکە بە خێر بە هەژاران بدرێت، خێر، یارمەتی، کۆمەگی، خەرمانلۆغە.

**خەرمان مانگ** (ئەردە.): خەرمانەی مانگ، ئاخڵە.

**خەرمانی سوور:** (ئەردە.) خەرمانسوور.

**خەرمشک** (ئەردە.): مشکی دەشتێ.

**خەرمووروگ** (ئەردە.): مووررووەکەرانە، مووروگەکەر.

**خەرناز:** نازکردنی یەکێک، کە لێی نەیەت.

**خەرنگەز:** مێشەکەرانە، جووره مێشێکی زلی سەوزکارە کە بە وولاغ بنیشێ کلکی پێ قیت دەکات ولە تاوان تا لە تووانایدا هەیە هەڵدێ.

**خەرنووک** (کە.): خرنووک.

**خەرۆ:** ڕام، ئارام، دەسخەرۆ: دەستەرۆ، کەوی. خەنی، شاد، شادمان، ـــ بوون، ـــ کردن. کەسێکە لە خۆی بایی و بێ ئەندازەکەیفخۆش بوو بێ. تەفرە. ـــ بوون: تەفرە خوواردن.

**خەروا** (شا.): ئەستوورکی ئاشەوانانە، چتی پەپکەی پانەوە بوو وەک پەنیر و هەنجیر و قیپری پانکراوە. تۆتۆیە، کە لە ژێر ئاگریدا برژێنرابێ.

**خەروار:** کێشانە و پێوانەیە بۆ دەغڵ و دانانی ووشک کە سەد پووت (مەن)ە.

**خەروە** (بابا.): نانە هەنجیرە، (هەورا.) لەپۆڕت.

**خەرووزە** (لو.): کاڵەک.

**خەرێنە:** خرێنە، گلۆڵەبەنی موو.

**خەرویزە:** (لو.) کاڵەک.

**خەری** (لو.): قوڕ.

**خەریت** (باک.): پیاوی زەلام و بەهێزە، کەڵەپیاو. (باک.) ئەوەیە کە لە خەرت دەدرێ.

**خەریتە:** جووره کوولەکەیێکی ئاوی و مل باریک و درێژ و بن ئەستوورە، ڕاوچی بارووتی تێدەکەن بۆ تفەنگی ڕەشۆکی ساچمەزەنی جاران کە لە لوولەوە دادەگیراوە و بارووتی تێدەکرا. فیشەکدان.

**خەریک:** گژ و وێژ، لە کارەوە چوو، لەمزگ، پێگرتی، خووەدی، خووەیی، لە گژ، کەسێکە لە کار و فەرمانێکەوە ئالاَ بێ، مژووڵ، سەرگەرم، خەجیل.

**خەریکە** (باک.): ئاخن، (ئەردە.) خەریکە، سەرگەرمە، خەجیلە.

**خەریک بوون:** لەمزگبوون، تێوەرووکان، تێبەربوون، لێ براوبوون، لێبران، لە کارێکەوە ئالاَن، لە کارێکەوە چوون.

**خەریک کردن:** خووە دی کرن، تێبەردان، یەکێک بە کارێکەوە کردن، یا لە کارێکەوە ئالاَندن.

**خەز:** جانەوەرێکی ناسراوە کەوڵی دەکرێتە بەری قاپووت و ئیتر، کەوڵی خەز، (باک.) ئەیار. ئێلێکی تورکی خوێنڕێژە لە مێژوودا بە خوێنخۆری بە ناوبانگن، کوردان لە دەست وان زۆر زیان و پەریشانی سەر و ماڵیان دیتووە.

**خەزاروو** (بار.): خەزایی، باڵندە.

**خەزاڵ:** نێوی ئافرەتانە.

**خەزام** (زا.): گەڵای زەردی پاییزان.

**خەزان** (دەر.): مەنجەڵی گەورە. (باک.) کاروباری خۆگنخاندن. (سەق.) گوڵی ڕێواسی. (ئەردە.) گەڵاڕێزان، پاییز.

**خەزانە** (ئەردە.): گەنج، گەنجینە.

**خەزانەدار**: گەنجینەدار.

**خەزانگردن**: گەڵاڕزانن، مووڕزاندن.

**خەزانی** (باک.): هەژاری.

**خەزایی** (موک.): باڵندەییێکە. (باد.) خەزارۆو، (شا.) عەیلەمەل.

**خەزەر**: خەزەڵ.

**خەزەرە** (هەو.): بەرەزا، بارێزە (گیایەکە).

**خەزەرۆک** (زرا.): بارێزە (گیایەکە).

**خەزەڵ**: جێژی، خەزەر، گەڵای دارانە کە پاییزان دەکەوێتە سەر زەوی و زستانانیش دەیدەن بە ووڵاخان. (هەورا.) بزنێکە لاڕوومەتەکانی و نیوە ڕاستی گوێی سوور بێ. (بابا.) بزنێکە تووکی دەست و شانی زەردباو بێ.

**خەزەڵ** (شەق.): گەڵای تەڕ و ناسکی گوێزییە.

**خەزەڵوەر**: گەڵاڕێزان، چرپاپیشی، باوەر، بارێزان، خەزەڵوەران، مانگی نیوە ڕاستی پاییزییە.

**خەزەڵوەران**: باوەر، گەڵاڕێزان، بارێزان، کاتی گەڵاوەرینی پاییزییە.

**خەزەڵۆک** (سور.): گیایەکی بۆنخۆشە، بەرەزا ژنان بۆ بۆنخۆشی بە بەرسینگیاندا دەکەن.

**خەزرین**: غەزرین، ڕق هەستان.

**خەزریو**: غەزریو، خەس.

**خەزن** (ئەردە.): ژنخوشک.

**خەزنە** (هەورا.): مرازێکە لە کەرستەی جووتی.

**خەزوبەز**: چێشتی خۆش و چەوور و قەڵەو، چزوفز، چزوبز. (هەو.) مرازێکە لە کەرستەی جووتی.

**خەزوور**: (باک.) خووە زوور، باوکی ژن و مێردییە، واتە خەزووری ژنی باوکی مێردییەتی، خەزووری مێردی باوکی ژنییەتی.

**خەزووران**: بەرەی خەزوور.

**خەزوورە**: خەزوور.

**خەزیاندن** (باک.): چاو پێ هەڵنەهاتن.

**خەزێم**: هی گوندان پانە بەڵان هی شاران پرپەری پێوەیە و ئەڵماس و لوولووشی تێدەخرێ، (کە.) ئەنرانە، خزمە، (باک.) خزێم، (دەر.) چوولیت، (هەورا.) لووتەوانە، قۆڵفەییێکی زێڕین یا زیوینە ژنان لە لووتیانی دەکەن بۆ جووانی.

**خەزیمووک** (زا.): چێشتی ترخێنە.

**خەس** (هەورا.): خەست، پەیت، توند.

**خەسارە** (زا.، خۆ.): کاریتە، نیرگەی خانوو.

**خەساس**: کەسێکە گیانداران بخەسێنێ.

**خەسان**: خەسێنران، خەسین.

**خەساندن**: ئەسپ و گاو ئیتر لە پەڕین خستن و هێلکەی گونیان دەرهێنان یا فلیقاندنەوەی گونی گیان لەبەرانە بۆ ئەوەی کە نەپەڕێ. شکاندنەوەی تەرزی تەماتە و ئیتر تا پەل باوێژێ و بەرداهێڵێ تا بەرەکەی زۆر و باشبێ. ئێختە کردن. خەرسکردن.

**خەساندی**: خەسێندراو، خەساو.

**خەسانن**: خەساندن (بۆ ووڵاخ).

**خەساو**: خەسێندراو، خەسێنراو، خەساندی، گیان لەبەری خەسێنراوە.

**خەسە** (ئەردە.): خەستەی توورەکەیە. (ئەردە.) ماندوو، شەکەت، مانیاگ. نەخۆش، ناساز.

**خەسەخانە** (ئەردە.): خەستەخانە، بیمارخانە.

**خەسەک** (ئەردە.): پێکوڵ. (باک.) ئەو کەسەیە ووڵاخان دەخەسێنێ.

**خەسبوو** (باک.): دایکی پیاوە بۆ ژن.

**خەست**: تیر، خەس، پەیت، توند، چڕ، بە پێچەوانەی وەی کە شل بێ.

**خەستە**: نەخۆش، بیمار. دۆیەکە کە لە ناو کیسەیەک کرابێ و توند بوو بێتەوە.

**خەستەخانە**: نەخۆشخانە، تیمارگە، نەخۆشگە، شوێنی تیمارکردنی نەخۆش.

**خەستەک**: چتێکە چتی زۆر شینی پێ دەچووێنرێ وەکوو دەڵێن: دەڵێی خەستەکی شینە.

**خەستەوی**: جوورە خورمایەکی نەرمە دەکرێتە حەلانەوە: ناو پووش.

**خەست بوونەوە**: توند وپەیت بوونی چتی شل.

**خەستی**: پەیتی، توندی (بە پێچەوانەی شلی).

**خەسرەو**: پادشا، شا، میر، خونکار. نێوی نێرینانە.

**خەسرەوانی** (ئەردە.): جۆرە کووپەیەکی گەورەیە، گۆزە و کووپەی زل.

**خەسم** (ئەردە.): زۆر، ستەم، ڕق وکین، داگیرکردن.

**خەسما** (باک.): بەتایبەتی.

**خەسوو**: ڕەووشی دایکی مێردییە بۆ ژن. خووەسوو، (فە.) خەسیرە، (هەورا.س) هەسرە. دایکی ژن و مێرد، بەڵام بە شێوەی باکوور تەنها دایکی ژنییە بۆ مێرد.

**خەسوولە**: پارچە دارێکی کورتە دووای بار کردن لە قەفێکی گوریسی دەخرێ و با دەدرێ تا بارەکە توونر بێ، بۆ کۆڵیش بە کاردەبرێ، (کۆ.) پێچەن.

**خەسیا** (هەورا.): خەساو.

**خەسیاگ**: خەساو، ئێختە.

**خەسیان**: خەسان.

**خەسیلو** (ئەردە.): خەساو.

**خەسیای** (هەورا.): خەساو.

**خەسیرە** (فە.): خەسوو.

**خەسێنراو**: خەساو.

**خەسین**: خەساندن.

**خەش**: خەوش، خڵتەی زێڕ و زیوییە. بێ ـــ: بێ خەوش.

**خەشە:** خەرار، جەوالی لە موو.*

**خەشخاش:** خڕخاڵی بە زەنگوڵەیە، جوورە خڕخاڵێکە ناوی هولۆڵە موم و چتی تری تێدە خرێ.

**خەشک** (باک.): ـــ کرن: داماڵین، خشاندن.

**خەشمی** (باک.): تەناف، گوریس.

خەشی

**خەشۆ:** گێل، گەوج، شێتۆکە.

**خەشوول** (باک.): گیایەکە مێش هەنگووین زۆری حەز لێدەکات، گەڵای زەردە.

**خەشیل** (زا.): جوورە گیایەکە.

**خەشیم:** گێل، حۆل.

**خەشیو** (ڕەوا.، خۆ.): کەندوێکی چوارگۆشە و گەورەیە و سەر داپۆشراوە بۆ دەخڵ و دان یا خانووچکە و کەپرێکە لە ژووراندا میوەی لە سەر دادەنرێ تا نەرزێ و مشک نەیخوا، کۆلین، (خۆ.، ڕەوا.) کولینە، ـــ کولێن. سەوەی شیری.

**خەف** (ئەردە.): خەو.

**خەفال** (باک.): ئاڵقە و تاووپێچی پرچ و کاکۆلانە.

**خەفالۆک:** بڕوانە: خەفال.

**خەفاندن** (سن.، ڕۆژ.): خەوار کردنەوە. سەر داخستن. نووانـدن، خەواندن.

**خەفانن:** خەفاندن، نزم کردن، پووچ و قۆپاندنەوە.

**خەفە:** خنگیاگ، (ئەردە.) تاسیاگ، کیپ، کپ، بێ دەنگ، خنکاو. سەماوەرێکە کونی گیرابێ و ئاورەکەی کوژابێتەوە. گیانداری تاساو. (ئەردە.) پڕ، تێکچڕژاوە.

**خەفەبوون:** خاموش بوون، پشوو، خنکیان، تاسیان، هەناسە بڕان، کوژانەوە، فەتسان، فەتسین، کپ بوون.

**خەفەت:** دڵمایی، دڵگیری، دلمانی، خەم، پەرۆش، دەرد، جخار، جەخار، دڵمان، دڵگیربوون، دڵتەنگی، پەژارە، پەشێوی، دڵپڕی.

**خەفەتبار:** پەژیو، دڵپڕ، خەمگین، پەرۆشدار، بارگران، دڵتەنگ، دڵکوڵ، تەمبار، پەشێو. ـــ بوون: قژیلین، قژین، ـــ کردن: قژیلاندن. ـــ ی: دڵتەنگی، خەمباری.

**خەفە تخوواردن:** دڵشکان، خەمخوواردن، وەزگدان.

**خەفەتدار:** نەهارەزگ، خەفەتبار. ـــ ی: نەهارەزگی، خەفەتباری.

**خەفەتدان:** دڵشکاندن.

**خەفەتکار:** خەفەتدەر، خامۆشکەر، کپکەر، بێ دەنگ کەر. ـــ ی: خەفەتدەری، بێدەنگ کردن.

**خەفەخان** (هەورا.): کۆخەرمشە.

**خەفەخانە:** خامۆشگا، جێگایەکی کپ و بێ هەست و خوستە.

**خەفەکەر:** خامۆشکار.

**خەفەکردن:** تاساندن، خنکاندن، فەتساندن، پشوو هەناسە بڕین، کوژاندنەوە، خەفەکردن، کپ کردن، کوژتن و لە ناو بردن.

**خەفتان** (ئەردە.): داری سەوڵەی کەشتیوان. (ڕەوا.، باک.) هەوڵدان، تەقەلادان، خەفتیان. پەیوەندێکە لە پاییزاندا دەکرێ تا بەهاری سەوز نابێ لە بەهارێدا لەگەڵ دارەکە سەوز دەبێ، گەفێکە پاییزێ بچێنرێ. کراسی شەڕێ، جوورە کراسێکی لە ئاوریشمی خاو دروست کرابێ لە کاتی شەڕێدا لەبەر دەکرا. جلکی شەڕییە، کە لە بن زرێ لەبەردەکرا.

**خەفتک:** خەوتوو، نستوو، نوستک.

**خەفتن** (فە.): نوستن، خەوتن، وەرکەوتن، خەوپیاکەفتن، بخەف: بنوو، نەخەف: مەنوو. بێدەنگ بوون.

**خەفتوو:** نستوو، خەفتک.

**خەفتیاتی** (ڕەوا.): تێکۆشان، کۆشەوە، هەوڵ و تەقەلا.

**خەفتیان:** هەوڵدان، تەقەلادان. (کە.) چلەی زستانییە بە پێی ژمێریاری گەرمێنی چونکوو دەغڵی تێدا شین نابێ.

**خەفتین**(ڕەوا.): هەوڵدان.

**خەفک** (باک.): تەڵە.

**خەفکردن** (ئەردە.): خۆداگرتن، چوونە ناو بۆسەوە.

**خەفک:** فاقە، تەڵەی باڵندان.

**خەفکگا:** خەوگە، نوستنگە.

**خەفکگە:** نوستنگە. (ئەردە.) شووێنی نوستن. چاڵێکە شیشە توتنی تێدا دادەنرێ.

**خەفۆک:** جوورە چارەوێیەکە لە کاتی جووانووێتییدا شیری مانگا و گامێشی خوواردبێ کە گەیشتە ناو ئاو لە ئاوەکەدا خۆی بە زەویدا دەدات. (کە.) خەوالوو، کەسێکە زۆر بنووێ. گایەکە لە کاتی جووتکردنێدا بخەوێ، بغوز. کەسێکە زۆر خەفەتێ بخووات.

**خەفیاگ** (ئەردە.): لکی دارێکییە کە لە ژێر زەوییەوە توولکێش کرابی تا بنجێکی دیکەی لێ پەیدابێ وەکوو دارەمێو کە بەسەر زەویدا ڕادەکێشرێ و ناوناوە خۆڵی بەسەردا دەکرێ بۆ سەوز بوون.

**خەفیرۆک** (باک.): لوولەکردن.

**خەل:** غەلّ، غەڵە، کەڵەکەبەرد.

**خەلات:** کفن. شاری خەلاتی، شارێکی کوردانە لە ژێر دەستی تورکاندا نزیکی گۆلی وانییە، بە عارەبی (أخلاط) ی پێدەڵێن. بەخشش، دیاری.

**خەلاتی:** چتێکە کە بە خەلات بدرێ، (ئەردە.) دیاری ناو تێلانە. جیاز.

**خەلال** (کە.): خورمای نەگەیشتوو.

**خەلان** (زا.): شکانی دەست و پێ.

**خەلانکە** (هەو.): بە تاڵی و چۆڵی هەرزاڵییە بە تا قەش دەڵێن. (ڕەوا.) تاقەیێکی گچکەیە، (هەورا.) خولانکە.

**خەلە** (هەورا.): دەغل، دەغڵی ووشک و دان، دان، دانەوێڵە، بارە. خلە، خشە.

خەلە

**خەڵەتان:** تەفرەخوواردن، فریوخوواردن، دەست بڕان.

**خەڵەتاندن:** فریودان، تەفرەدان، دەست بڕین، قۆڵ شکاندن.

**خەڵەتانن:** تەفرەدان.

**خەڵەتاو:** فریوخوواردوو، فریودراو، تەفرەدراو.

**خەڵەتکۆر** (زا.): جرجی کوویر.

**خەڵەتێن:** هەڵخەڵەتێن، فریودەر، تەفرەدەر.

**خەلەجا:** ئێلێکی کوردە لە ژێری شاری ماردینێیە.

**خەلە، خەلێ** (هەورا.): بە هەموو جوورە دەغلێکی دەلێن.

**خەلەسکوو** (سور.): مەبەس.

**خەڵەف** (ئەردە.): تێکوڵی دارانە.

**خەڵەفاگ:** خەڵەتاو.

**خەڵەفان:** خەرفان، شێوان لە بەرپیری.

**خەڵەفاو:** کەسێکە لە بەرپیری شێوابێ.

**خەلەفرۆش:** دەخڵفرۆش، گەنم فرۆش.

**خەلەفرۆشی:** پیشەی دەخڵفرۆشی.

**خەلەفرۆشیاگ:** خەلە فرۆشی.

**خەڵەفیاگ:** خەڵەفاو.

**خەلەفین:** خەلەفان.

**خەلەک** (باد.): ئاڵقە، ئاڵقە ئاڵقە، ئاڵقەیەکە وەکوو ئەنگوستیلە لە قامک دەکرێ.

**خەلەکوو** (باد.): خۆڵەمێش.

**خەلەنوور:** جوورە گیایەکی شیرینە دەخورێ.

**خەلەوخەرمان:** دەغڵ و خەرمان. خانم و خاتوون.

**خەلەوورەش** (هەورا.): دەخڵفرۆش.

**خەڵپە:** غەڵبە.

**خەڵپەخەڵپە:** غەڵبەغەڵب، (هەورا.) غەوغا، هەراوهووریا.

**خەڵیۆت:** ژەکێکە لە ئاگردانی گەرم کرابێ و مەیی بێ.

**خەلیووت:** ژەکی ئاژاڵ و ماڵاتی تازە زاوە لە نێو ئاگردانێک دەکرێ تا دەمەیەت کە سارد بۆوە دەریدێنن و دەیخۆن.

**خەڵت:** هەڵە، ناماقووڵی.

**خەڵتان:** شووێنێکە لە ئەندام یا چتێکە، کە زۆر خوێناوی بێ ساسەری بێ یا کراسەکەی بێ، خەڵپان، ـــ ی خوێنە: لە خووێن هەڵکێشراوە.

**خەڵتانە** (هەو.): گیایە ددانی پێ دەئاژننەوە بە ووشکی ئەم گیایە لەلای سەرەوە دەسکە پووشێکی دێنێ هەریەکەی بەقەدەر قامکێکی درێژە و باریکە ددانی پێ دەئاژننەوە بەژنێک بڵند دەبێ، (کۆ.، با.) خەلیلە.

**خەڵتە** (کە.): قەلادەی تاجیانە.

**خەڵف:** نەمامێکی تازە رووراوی یەکساڵانەیە لکی یەکساڵانەی دارێیە، (باک.) سادیل، پەژیک، (هەورا.) شات.

**خەڵک:** مەردوم، مرۆڤ، مرۆڤان.

**خەڵوا:** خەروا.

**خەڵوار** (موک.): کێشێکە بە ئەندازەی ٢٤ پووتان.

**خەڵوەت:** شووێنی پەنهان، چۆڵ، تەنیا. ـــ ی: شانشینی، گەنجینە، لابیان.

**خەڵوەخانە:** خلوە (ع.) و خانە (کوردییە): پەناگە، شووێنێکی نهێنی و پەنهانە شووێنی خودا تێدا پەرستنی کوردانە لە وێ گوناه و تاوانانی خۆیان وەبیر خۆیان دەهێننەوە و نەفسی خۆیان پاک دەکەنەوە.

**خەڵووز:** ڕەژی، ڕەژوو، زوخاڵ، ڕێژوو، ـــ ی بەرد: نوورە، ڕەژووی بەرد.

**خەڵووزان:** ڕەژوودان، خەڵووزدان.

**خەڵۆزە** (شا.): خاڵۆزە، (شا.) خارووزە.

**خەڵووزە** (شا.): ئازارو ئاهۆیەکی شیناوەردییانە ڕەشی دەکات، دەردێکە وەکوو دۆشاو وایە بەسەر داراندا دەبارێ یا داران دەری دەکەن.

**خەڵووزەتەوەنی** (هەورا.): ڕەژووی بەرد.

**خەڵووزدان:** خەڵووزان، ڕەژوودان.

**خەڵووڵ:** میچ (جک)ی لاقی ڕەشە ووڵاخییە.

**خەلی** (باک.): دەخڵ، خلە.

**خەلێخە** (باک.): بۆگەن، زەدەدار.

**خەڵێف** (بڵ.): گەوار (کەوار)، زەمبیلی هەنگان، کادی مێش، کۆچمێش، پلوورەی توولێنی مێش هەنگوین.

**خەلیلە:** گیای دان، ئاژن.*

**خەلێلە** (کۆ.): خەڵتانە، گیایەکی بالآبەرزی بەهارییە گوڵێکی پژپژی دانەدانە دەگرێ پژەکانی ددانی پێ دەژێنرێتەوە.

**خەلیت** (باک.): خەریتە، فیشەکدان، خەلیتۆک، (زا.) دەرمان و ئەسپابی تفەنگی شینکەیە.

**خەلیلۆک** (باک.): گیایەکە وەکوو گێزەری وایە لە چۆلی شین دەبێ منداڵ دەیخۆن، (باک.) لۆڤک.

**خەلیلی:** جوورە ترێیەکە لە موکریانێدا زۆرە سپی و خڕو ووردە لە پێش هەموو ترێیەکی تردا پێدەگات، (ئەردە.) کۆت ئەو کۆلکەدارەیە کە بە ئالقە لەلاقی گرتووان دەکرێ.

**خەم:** پەرۆش، پووشکووڵ، سوو، تاو، غەم، کزی، پەژارە، خەفەت، کەسەر، (هەو.) مەینەت، ئالووس، (باک.) بار، تەم، پەژارە، پەشێوی: ـــ ڕەواندن. ـــ خوواردن: بە پەرۆش بوون، خەمگین، پیشاندن، پیشخوواردن، لە خەمان: لەتاوان، لە پەرۆشان. چەماو، پێچ، خەمازە، چاکڵە، چەمیاگ، کۆم. ناز و گریشمە.

**خەمازە:** چاکڵە، چەڵەمە، چوکڵە قولاپ.

**خەمەخۆرە:** باڵندەیێکی گەورەی لاق درێژ و ملدرێژە هەمیشە بە ماتی لە قەراخ ئاوان هەڵدەنیشێ.

**خەمەگروو:** شینشینک، دەعبایەکی بەڵەکە وە شینشینکی دەچێ لە چۆڵی دەژی بە قەد مشکێکییە کلکی نە زۆر کورت و نە زۆر درێژە، سەری هەر بڵند و نزم دەکات لە ڕاوەستانێدا، قمقمۆک، قومقومۆک.

**خەمبا:** ئاوسانێکی کەمە کە بکەوێتە لەشەوە.

**خەمباتێکەوتن:** کەوتنی خەمبا بۆ لەشی گیان لەبەرێکی.

**خەمبار:** خەفەتبار، دڵپڕ، تەمبار، تەمین. ـــ ی: خەفەتباری، دڵپڕی.

**خەمبەر:** جوورەگۆرانییێکی کوردییە.

**خەمخووار:** غەمخووار، خەمخۆر.

**خەمخوواری** (باک.): ماخولیایی، مشوور، بە تەنگەوەبوون.

**خەمخۆر:** خەمکەی خەمان، مشهەت، دەربەند، بە مشوور، خەمخووار، (هەورا.) خەمخووەر، پەشێو، تەمبار.

**خەمخۆرە:** باڵندەییێکی قاچ و مل درێژە هەمیشە لەگوێ ئاودا بە ماتی دەنیشێ، خەمەخۆرە.

**خەمخۆرک** (کە.): جێگایەکە گڵەکەی ڕزیو بێ کە پێی لێ نرێ: ڕۆچێ، (هەو.) زەندۆڵ، قەڵشتی زەوی لە هاویناندا.

**خەمخۆرکە:** خەمخۆرک.

**خەمخۆرگ:** خەمخۆر.

**خەمخۆری:** خەمخواری، مشوور، هۆڵ، تاسواس.

**خەمرە** (کە.): تورخەکردن لەبەر چتی چەوور خواردن و زۆر خواردن.

**خەمرەشۆک** (هەو.): گیایەکە قامکێک بڵندە و گوڵی ڕەش دەر دەکات، خمرەشۆک.

**خەمرەڤێن** (باک.): خەمرەوێن. ـــ ی: خەمرەوێتی.

**خەمرەوێن:** چتێک یا کەسێکە خەم و پەرۆشی بڕەوێنێ، خەمرەڤێن. ـــ ی: خەمرەواندن.

**خەمزە:** (ئەردە.) غەمزە و ناز، ناوی دێیەکییە لە شار بازێڕی.

**خەمزەکردن:** نازکردن، خنچکەکردن.

**خەمزەگەر:** مازگەر، خنجەگەر.

**خەمسار** (گەر.): خەمسارد.

**خەمسارد:** خەمسار، سستەپەلە، ئەو کەسەیە لە کاراندا سست و تەمبەڵ بێ. ـــ ی: خەمساری.

**خەمساری:** خەمساردی.

**خەمشەسەرێ:** بۆ کارێک بە کاردەبرێ، کە بە ناپوختی و ناڕێکی بکرێت، دەڵێن: فیسارەکەس بە ـــ کارێ دەکات.

**خەمشۆک** (باک.): خشتیلە، گچکە و جووان، قشتیلە.

**خەمکەی خەمان** (کە.): کەسێکە خەم و پەرۆش بۆ هەموو لێقەوماوێکی بخوات، دڵسۆز، میهرەبان، خەمخۆر.

**خەمگیر:** خەمگین. ـــ ی: خەمگینی.

**خەمگین:** غەمگین، بەپەرۆش، پەرۆشدار، کز، شانی، داماو، خەڵۆک، بڕەش، خەمبار، خەفەتبار. ـــ بوون: پەرۆشدار بوون. ـــ کردن: پەرۆشدارکردن. ـــ ی: پەرۆشداری، خەمخواری.

**خەمل** (باک.): خشڵ، چەک، ئارایش.

**خەمڵ:** بەهەندگرتن، دانان، ڕەووش. ـــ کردن: خەملاندن، ڕازاندنەوە.

**خەملان:** ڕازانەوە، خەمڵین، جووان کران.

**خەملاندن:** ڕازاندنەوە، خەمڵ کردن.

**خەملانن:** خەملاندن.

**خەملە** (باک.): خەملا بخەملاخستن: بە پێداگرتنەوە لێکدان.

**خەمڵە** (هەورا.): خەم.

**خەمڵچی:** دانەر، واگر.

**خەمڵچێتی:** پیشەی خەمڵکردن و لە بڕیە و گۆترە بە هەند دانان.

**خەمڵ کردن:** تەخمین کردن، دانانی ئەندازەیەک لە بەر بۆ ووشکە دان بە بەری ڕەزان و باخ بۆ ئەوەی بەو پێیە مڵکانە یا باجی لەسەر وەربگیرێ.

**خەمڵین:** ڕازانەوە، خۆجووانکردن، جووانکران. پێگەیشتن و بەخۆدا هاتنی هەموو چتێک.

**خەمڵیو:** جووان، ڕازاوەوە، (هەورا.) ئارا، ڕازیاوە، چتێکە کە بە خۆیدا هاتبێ.

**خەمناک:** خاک بەسەر، خاکەسار، پەرێشان، بەدبەخت، چارەڕەش، لێ قەوماو، خەمبار، دڵتەنگ، پەرۆشدار، نەچین. ـــ ی: خاکبەسەری، خاکەساری، پەرێشانی، بەدبەختی، چارەڕەشێتی، لێ قەوماوی، دڵتەنگی، پەرۆشداری، خەمبار.

**خەمناندن** (باک.): ڕێزگرتن.

**خەمۆ** (باک.): مرازی زوویری و پرسیارێیە.

**خەمۆش:** خامۆش، سەبووری، فەرامۆش.

**خەمۆشی:** خامۆشی.

**خەموور** (زا.): مەڕێکە، کە ناوچاوانی خاڵخاڵبێ.

**خەمێ** (کە.): چکێ، کەمێ.

**خەمیازە** (کە.، جەبا.): تێمیسکێکە لە دووای تاولەرز، کە لە دەورەی لێوان دێت، کاک عەلی کوری مەلافەتاح گوتوویە: خەمیازەی دەوری خێوەتخانەی غەم هۆردانە ئەتراف سەرچەشیی زەمەرەم.

**خەمیر:** (ڕۆژ.، شەبە.، فە.) هەویر.

**خەمیرترش** (ڕۆژ.، شەبە.، فە.): هەویرترش.

**خەمیس:** گوێز و مێوژی کوتراوە.

**خەمیلاندن** (زا.): جووانکردن.

**خەمین:** خەمگین.

**خەن** (هەو.): گەردن.

**خەنازیل:** کوانی زل، کە لەمل دێن. *

**خەناق** (باک.): گەردن، ئەستۆ، مل.

**خەنان:** پشکووتوو، کراوەوە. ڕووخۆش، ڕووکەش، دەم بە پێکەنین. کراوەوە.

**خەنانە** (هەو.، کە.): خەنەبەندان.

**خەناووک:** خەنارکە.

**خەناوکە** (کۆ.، هەو.): بەرموور، مێخەکبەند، گەردنبەند، (دەر.) ملوانکە.

**خەناوی:** خناوی.

**خەنە:** (ماو.) خنە، (دەر.) خەنێ، خنە، هنە، گیایەکی سەوزە دەهاڕرێ ژنان بۆ جووانی لەسەر و دەست و پێیان دەگرن. خەندە، پێکەنین.

**خەنەبەندان:** (هەورا.، کە.) خەنانە، شەوێک پێش بووک هێنانی ژنان بانگ دەکەن خەنەی دەبەشنەوە بە کۆمەڵ خەنە لە سەر و دەست و پێگرتن بە بۆنەی شاییەوە.

**خەنەتیلکە** (کۆ.، بابا.): خەنەگورگە.

**خەنەران** (خەنەران) (ئەردە.): ڕووخۆش، دەم بە پێکەنین، ڕووگوشاد.

**خەنەق:** خەندەک.

**خەنەک:** خەنۆک، خەندەق.

**خەنەگورگە:** خەنەتیلکە، (باک.) بیرۆبەرتک.

**خەنەڵ:** جوورە بزنێکە تووکی سەرشانی و دەستی زەرد باو بێ وەکوو لە خەنە گیرابێ.

**خەنەیی:** حەنایی، ڕەنگی خەنەی، ڤرگوول.

**خەنجەر:** خەنجەر، تیغێکی تایبەتی کوردانە، ـــ ی سەربەگۆ، ـــ ی سەربەدوویشک، ـــ ی شینەتیغ، ـــ ی جەوهەردار.

**خەنجەرە** (ئەردە.): بەردێکی گچکەیە لە تەنیشت قەبری دادەنێن بۆ ئەوەی دیاربێ، کە مردوو پیاوە و ژن نییە.

**خەنجەربازێ:** یارییێکە بە خەنجەری ڕووت دەکرێ. ـــ ی: یارییەکە هەندێ کەس بە خەنجەری ڕووت دەیکەن.

**خەنجەربالا:** باڵخەنجەرە.

**خەنجەربال:** خەنجەربالا.

**خەنجەردەم:** دارکونکەرە.

خەنجەردەم

**خەنجەردەمە:** خەنجەردەم، جوورە کوللەیەکی کلک درێژە.

**خەنجەلیس** (زا.): خەنجەلیسک.

**خەنجەلیسک** (شن.): گیایەکە بنەکەی دەخورێ.

**خەنجۆک:** خەنجەر.

**خەنچەر:** خەنجەر.

**خەنچەری سەردووپشک:** خەنجەری گۆدار، خەنجەری سەر بەگۆ.

**خەندان:** نێوی ئافرەتانە.

**خەندەق:** چاڵێکی قووڵی درێژە، کە لە زەویدا هەڵکەندرا بێ لە دەوری شار و ئاوایی و شوێنانی تووش و عاسێ دا تا دوژمن نەتوانن بە سواری پێیدا دەربازبن یا تێیدا دەچنە بۆسەوە بۆ شەڕ.

**خەندەقدانەوە:** بناغە دانەوەی دیوار، هەڵکەندنی خەندەک.

**خەندەک:** سەنگەر، ـــ هەڵقەندن: سەنگەرهەڵقەندن. (ژە.، باد.) زۆرانێ. (باد.) حیز.

**خەندەکووک** (باد.): کۆخەڕەشە.

**خەندەلک** (باد.): گیایەکی خواردنییە، خەردەل، خەرتەلە.

**خەندەلێو:** دەم بە پێکەنین، زەردەخەنە. *

**خەندکین** (سور.): خنکان.

**خەنز** (باک.): بۆگەن، بێگەن، گەنیو.

**خەنزراندن** (باک.): لە جوولەخستن، بێهەست کردن، (زا.) هەڵکرووزاندنی مووی سەر و پێی ئاژاڵ لە سەر ئاگر بۆ پاک کردنەوەی.

**خەنزرین:** بێ هەست بوون، بێ جوولەبوون.

**خەنۆک:** تاجییەکە لە ڕاوێدا دەغەڵ بوو بێ و ڕاوێ باش نەکات لە بەر بێ تینی یا پیری. بۆ کەسێکی بەو شێوەیەش بە کاردەبرێ.

**خەنی** (هەورا.): خەنە. کەیفخۆش، زۆرخۆشحاڵ، خەڕۆ.

**خەنی بوون:** خەڕۆبوون، شادبوون، گەش بوونەوە، دڵخۆش بوون، پشکووتن

**خەنیکە** (شکا.، باک.): بەن قادە، بەن کڵاوە.

**خەنی کردن:** خەڕۆکردن، شادکردن، گەشکردنەوە، دڵخۆشکردن: پشکواندن.

**خەنیم:** دوژمن، نەیار، هاوشان، کەسێکە، کە وەکوو یەکێکی تر وا بێ لە دەستەڵات و هێزدا دەڵێن: فیسارەکەس ـــ ی دە کەسانە واتە دەرەقەتی دە کەسان دێ.

**خەنین:** پێکەنین.

**خەنینەوە:** پێکەنینی بە کوڵ.

**خەو:** نووستن، (هەورا.) وەرم، خاو، هوێتە، وەنەوز؛ ـــ ی خۆش، کرخاو؛ ـــ هاتن: تەورین. ـــ م ڕەوی: خەولەن چوو. ـــ م هات: خەوا من هات. بە ـــ دا کەوتن: دخەوڕاچوون. (فە.) خەوون، خەوتن.

**خەوار** (باک.): کەسێکە زۆر حەز لە نوستنێ بکات، گیاندارێکە زۆر بنووێ.

**خەونەشوپەشو:** خەونی ئاڵۆز.

**خەواڵوو:** خەڤۆک، خەواوی، خاوێر، کەسێکە خەو گرتبێتی.

**خەواندن:** وەرخستن، نوواندن، خەفاندن، (هەورا.) وەرماندن.

**خەواوی:** خەواڵوو.

**خەواهاتن** (ئەردە.): وەئاگاهاتن، بێداربوونەوە.

**خەوەر:** ئاگا، ئاگاداری، دەنگ و باس. وریا، ئاگادار، بێدار. (ئەردە.) دەنگ، باس، ئاگایی، هەواڵ.

**خەوەڕەوەبوون** (ئەردە.): بێدار بوونەوە، وریا بوونەوە.

**خەوەڕەوەکردن** (ئەردە.): بێدار کردنەوە.

**خەوەردار:** ئاگادار، هۆشیار، بێدار. ـــ ی: ئاگاداری.

**خەوەردان:** ئاگاداری دان. خۆرەتاودان، هەتاودان.

**خەوەکوتکە** (هەو.): وەنەوزە.

**خەوەنووچکە:** وەنەوزە، وەنەوزە کوتێ.

**خەوەنووچکێ:** وەنەوزە، وەنەوزەکوتێ.

**خەوبەسەرچوون:** خەوزڕان.

**خەوبردنەوە:** بۆنژین، نووچ بردن بە دەم خەوەوە.

**خەوبینین:** خەون دیتن.

**خەوپەرێشان:** ئەمار، (باک.) تەرم.

**خەوپەڕین:** خەوزڕان.

**خەوپەڵچێوە** (کۆ.): گرانەخەو، دەردێکە لە گرانە خەوێ پەیدا دەبێ، لە کاتی تووکردنێدا دەڵێن ـــ ت گاتێ.

**خەوپیاکەفتگ:** نوستو.

**خەوتەقین:** خەوزڕان.

**خەوتن:** خەفتن، نوستن، وەرکەوتن، هوویتن، (هەورا.) بووسان، ووتەی، بخەوە: (ڕۆژ.) بووێس، (فە.) بخف.

**خەوتنان:** کاتی نوستنی شەوێ.

**خەوتوو:** نوستوو، وەرکەوتوو، نقستی، نوستی، ڕازایی، کرۆکە.

**خەوجە:** تەمرهێندی.

**خەوخانە:** خەوگا، ژووری نوستن.

**خەوخاندن:** وێکچوواندن. گێژکردن، سەر لێ شێواندن. خستن. نوواندن، خەولێخستن، وەرکەواندن.

**خەوخۆش:** کەسێکە زوو خەوی لێ بکەوێ و درەنگ بێدار بێتەوە.

**خەوخی** (باک.): تێکەڵاو، شپرزە.

**خەوخین:** وێکچوون.

**خەوور کرن** (باک.): زەوی کێڵان.

**خەوراندن** (گەر.): کولاندنەوەی برین.

**خەورار** (باک.): نان و کولێرەی مێووژی.

**خەوران** (گەر.): کولانەوەی برین؛ برینا من خەوری.

**خەوراندن:** کێڵانی زەوی، بخەورینە: بکێڵە.

**خەورە** (باک.): کولێرەی گەورە و پانە.

**خەورەواندن:** خەوزڕاندن.

**خەورەوێن:** خەوزڕێن، چتێکە خەو ببات.

**خەورەوێنی:** خەوزڕێنی.

**خەورەوین:** خەو زڕان، خەوزڕین، ڕەوینەوەی خەو.

**خەورین** (باک.): کێڵرانی زەوی، بخەورە: بکێڵە.

**خەوزڕان:** خەوڕووان، خەودوورکەوتنەوە، خەوڕەوین.

**خەوزڕاندن:** خەوڕەواندن.

**خەوزڕێن:** خەوڕەوێن.

**خەوزڕین:** خەوزڕان، خەوڕەوین.

**خەووش:** خەش، خڵتەی زێڕ و زیوی، سیس و دەستاژۆ. زیوان و خشت و خاڵی ناو دەغڵە، تۆز، پەڵە، لەکە، زبڵ.

**خەوش و خاڵ:** زبڵ.

**خەوش و خامچ** (هەورا.): کرش و کاڵ ڕێژ.

**خەوفەڕەڤین** (باد.): بێداری، خەوڕەواندن.

**خەوگا:** شوێنی تایبەتی نوستن، خاوگە، خەوگە، خەفگە، خەفگا.

**خەوگە:** ژووری نوستن، (باک.) خاوگە.

**خەوگران:** خەوقورس و درەنگ بێداربێتەوە.

**خەوگرانی:** خەوقورسی.

**خەوگرتن:** سەردانی خەو لە یەکێک و خەواڵوو بوونی.

**خەوگرتنی:** قەدەغەکردنی یەکێک لە نوستن بۆ سزادانی.

**خەولێکەوتن:** وەرکەوتن.

**خەوماش** (باک.): بیرەخەو، ـــ بوون: لە بیرە خەوەوە چوون.

**خەوۆک:** کەسێکە زۆر بنوێ.

**خەوون:** (هەورا.) وەرم، خاو، هۆر، هۆرم، ـــ دیتن: وەرم دیەی. ـــ لێکدانەوە: (هەورا.) وەرم دیەی. دوودڵی، نیگەرانی.

**خەونامە** (کە.): خەوننامە.

**خەوننامە** (کە.): خەونامە.

**خەونووچکە:** وەنەوزە، وەنەوزەکوتێ.

**خەونووچکێ:** وەنەوزە، وەنەوزەکوتێ.

**خەونی پرووپووچ:** (نە.) ئاشووپ پاشوو.

**خەویە** (سور.): بەرکوتی دەغڵی.

**خەی:** ئۆخەی، لە کاتی خۆش و شادیدا دەردەبڕێ.

**خەیاتە:** دەزووی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگە.

**خەیاتەکێش:** جوورە دەرزییێکی گچکەی کون بچووکە پتر خەیاتەی پێوە دەکرێ.

**خەیاتەی جنلوکە:** داو و تە لێکی باریک و درێژە لە کاتی گەرمایەدا لە نێو هەوادا دەبیندرێ.

**خەیار:** (هەو.) هاروو، هاروێ، ئاروو.

**خەیارە:** خەیارۆک، قوونێرێکە لە بن ڕان یا لە بن دەستی دێت یا لە ئەسکنجی، کە دەربوو کێم و هەوای زۆر لێدێ و بەقەد خەرێکی دەبێ.

**خەیارتوم** (ئەردە.): کالیار.

**خەیارچەمبەر:** (هەورا.) خەیارچەمەر، جوورە دارێکی گەرمیانییە بەرەکەی وەکوو لوولە قامیش وایە ناوەکەی خانەخانەیە چەند پەڕەیەکی تێدایە لە نێوانیاندا دانەیەکی زەردی تێدایە پەڕەکانی لە ئاوێدا دەسووڕێتەوە بۆ ڕەوانی دەدرێ بە منداڵان.

**خەیارۆک:** خەیارە.

**خەیاری دێمی:** گووژاڵک، کاڵەکمارانە.

**خەیاڵ:** نیاز، بیر و هۆش.

**خەیاڵی خاو:** خەیاڵی خام، نیازی خاو.

**خەیانن**(ئەردە.): خایاندن.

**خەیخەی:** ئۆخەی، هەیهەی، بەهبەه.

**خەیداندن** (باک.): تووڕە و زیز و سەخڵەتکردن، زویر و تووڕەکردن.

**خەیدین** (باک.): زیز و سەخڵەت و تووڕەبوون.

**خەیر:** نە، نا، نەء، نەخێر، وەڵامی بەر پەرچدانەوەیە. خاسە، خاسی.

**خەیرا:** خێرا، بە پەلە، توندوتۆڵ.

**خەیس**(خۆ.): تووی ووشکی کوتراوە، کە کرابێتە سەلک.

**خەیم** (باد.): خوو و ئەداو ڕەفتار.

**خەین** (باک.): بێجگە، جگە، بێ لە. ـــ اوی: بێجگە لەوی.

**خپ:** خامۆش، کپ، مات؛ دارا لە بەر نوستن یا شەکەتی ـــ بووە.

**خپە:** مات، ـــ کردن، خۆمات کردن. پرخە، پرخە پرخ دەنگێکە لە لووتەوە دێ یا لە زار لە کاتی نوستن یا ماندوویێتیدا.

**خپە خپ:** پرخەپرخ، دەنگێکە لە دەم و لووتی نوستووانەوە دێت.

**خپکردن:** کوژتن؛ بەردێکی بەسەری مارەکە دادا خپی کرد. پرخەکردن.

**خپلاک** (زا.): کورسی و دەرگای ڕزیوی کۆن.

**خپ هەڵاتن:** خپ بوون، کپ بوون، کپ کەوتن، کپ هەڵاتن، خپ هەڵهاتن

**خت:** ختتە، کتە، کتتە، فس، فسس، ووشەیێکە پشیلەی پێ دەردەکرێ.

**ختە**(ختتە.): بڕوانە: خت.

**ختتەخت:** فسسەفس، کتتە و کتت، پشتەپشت، دەنگێکە بۆ دەرکردنی پشیلە بەکاردەبرێ.

**ختەکردن:** خت و فسە کردن، پشیلە دەرکردن.

**ختەپتی** (فە.): قدیلکە.

**ختختە** (کە.): قدیلکە.

**ختک:** پشیلە.

**ختکە** (کە.): قدیلکە، ختوکە. ـــ دان: قدیلکە دان، (کە.) قدغەدان.

**ختکێ** (ئەردە.): قدیلکە، ختێ، خرووک. پشیلە.

**ختکێنە** (ئەردە.): ختێنە، هاندەر، بزێو، دغدغەدەر.

**ختلە** (هەورا.): قدیلکە.

**ختلی** (هەورا.): ختوکە، قدیلکە.

**ختمی** (شکا.): سەرکێش، یاخی.

**ختمین:** سەرکێش بوون، یاخی بوون.

**ختۆکە:** هەستێکی زۆر کەمە وەکو تەزوو، هەستێکی ختۆکە ئاسا هانی دەدا، کە لە جێی خۆی دابنیشێ.

**ختووکە:** ختۆکە، قدیلکە.

**ختووکەدان:** قدیلکەدان.

**ختێ** (ئەردە.): پشیلەی نێر، گوربە. ختوکە، ختکێ.

**ختێلکە** (باک.): قدیلکە.

**ختێنە:** ختکینە.

**خجڵ:** خەریک، لەگژ.

**خچ** (باک.): دەنگێکە کاتێک بەکاردەبرێ، کە گۆلکی بانگ کەن.

**خچان** (هەو.، کە.): تێکـەوتن، دۆڕانـدن، تـەفرە خـواردن، (شـا.) ئەنگێوران.

**خچاندن** (هەو.، کە.): تێخستن، لە خشتەبردن، تەفرەدان.

**خدرولاس** (هەو.): نێوی دووهەفتـەی حەوتـەم و هەشتـەمە لـە هەشت هەفتەکانی زستانێدا، کە دووای هەموویان سێ ڕۆژ لە زستانێ دەمێنێ، هەتیمیشی پێدەڵێن.

**خـلۆک** (بـاک.): کـز، خـەمگین، پەرۆشـدار، دامـاو. نازنـاوی دامـاو(حسێن حوزنی) موکریـانی برامـە، کـە یەکـەمین کەسـە مێـژووی کـوردی بـە زمـانی کـوردی نووسـیبێتەوە و لـە ١٩١٥ دا دامـەزرێنـەری چاپخانەی کوردستانە، ئەم نازناوە بەهەشتی سـەید تاهای شـەمزینی بۆی هەڵبژاردووە لە جیاتی (حوزنی).

**خلو:** خوو، نەریت.

**خلووک:** ختوکە.

**خدێ** (ئەردە.): سەرگەرمی، بەستەکی.

**خدێدان:** سەرگەرم بوون.

**خدیو:** پادشا، خودان، خێو، خاوەند.

**خر** (باک.): گیایەکە وەکو گێزەر وایە.

**خڕ:** هـەموو، گشـت، تێکرا، خشـت، هـەمی، تـەواو. (بـاک.) جـەنجاڵ، پاڵپێوەنان. (بـاک.) خڕە، دەنگێکە.گرد، کۆ. ـــ کردنـەوە: کۆکردنـەوە، جڤاندن، کۆمەڵەکردن. ـــ بوونەوە: کۆبوونەوە. (هەورا.) خڕکەبەرد. گـەڕ، کرۆڤـەر، گروڤـر، گلینـک، هنـارک. کەنـە، بەسـتێکە بـەردی زۆر بـێ، بەستۆرە، شیو، شیوەڵە، دەرە، چق، زەنـدۆڵ، جێ لافاوێکە، کە خـڕە و بەردی زۆر بێ. وورده بەرد. تەواو، پیاوەکان بە ـــ ی هاتن: هەمووهاتن. خڕکـە بـەرد. تێکجاری، دەرگایەکەی بە ـــ ی داخـە، بـەتێکجاری داخـە، واتە شمشیرە(گوڵە) کەی بە ـــ ی ڕەتکە.

**خرا** (موک.): گەند، خراپ، گەندەژ، ـــ کردن: ئاراندن. (باک.) بەفیز، بەهەوا، لووت بڵند.

**خراپ:** خراو، بەرباد، (بان.) گەندەژ، گەن، گەند، توون، تـەباش، نـەچێ، بەد، چتی بێ فەڕ. ـــ کردن، تێکدان، (باک.) بـەرتیل کرن، مـەرکاندن، مەزاختن. ـــ بوون: مـەرکین، مێورزی، مەزاختن، لە کەڵک کەوتن.

**خراپە:** واژی چاکەیە، بەدی، کردار و گوفتاری ناپەسند.

**خراپەکار:** خراپەکەر، بەدکار.

**خراپەکردن:** چتی بەدو نارەواکردن.

**خراپتر:** گەندتر، بەدتر.

**خراپترین:** گەندترین، بەدترین.

**خراپی:** بەدی، گەندی، بێ فەڕی.

**خراخڕ** (باک.): خڕەخڕ کردنی گەروو لە نەخۆشیدا.

**خرار:** خەرار.

**خرارک** (باد.): خەرار.

**خراش:** ڕووش، رووک، ڕنران.

**خراشان:** ڕنران.

**خراشاندن:** خراشیان، ڕووشاندن.

**خرام:** شوێنێکی بەردەلان و هەڵەت و زوورگە.

**خرامان:** خەرامان.

**خران** (موک.): خستران، (باک.) هەڵخەڵەتان، فریوخواردن.

**خراندن** (باک.): فریودان، لەخشتـەبردن، هەڵخەڵـەتاندن. لێپەڵسوون، خشاندن، سووین، تێپەڵسوون، لێسوون، خڕەخڕلێپێنان، دەنگ لێوە هێنان.

**خراو:** خستراو. خراپ، گەند، بەد، بێ فەڕ. ـــ بوون. ـــ کردن. کاوول، وێران.

**خراوە:** کەلاوە، خراپە. بەدی، گوناهکاری. گوناه، چتی نەشیا. دزی. ژن پەرستی، مێ بازی.

**خراوەگەر:** خراوەکەر.

**خراو ووتن:** جنێودان، دژێن دان، بەد وێژی، خوسپ.

**خراو وێژی:** بڕوانە: خراو ووتن.

**خراوی:** خراپی، چەپەڵی، شوورەیی. کاولی، وێرانی، پەشێوی.

**خرایی:** خراپی. هەوا، فیز، لووت بڵندی.

**خڕە:** دەنگی وێک کـەوتنی دوو یا چـەند چتی ڕەقە. خڕەخـڕی گـەروو، دەنگێکـە وەک دەنگی گوێز و کـاڵای شـۆدار و ڕووخانی دیوار و دەنگی قاقەز.

**خڕەخڕ:** خڕەی یـەک لـە دووای یـەکتری، خڕەخـڕی زۆر. (بـاک.) خـڕڕە، قرخە، قرخەقرخ. دەنگی گەروو و نیترە. خشەی کاغەز یا کاڵای تازە.

**خڕەپانکە** (کۆ.): جوورە ماسییەکە.

**خڕەپیچک** (باک.): شەڕوکێشە، پیلە.

**خڕەجاڕ** (کە.): بەست یا زەوییەکە بەردی زۆر بێ، خڕەڵان.

**خڕەفان:** گێل و گەوج بوون لە بەر پیری یا نەخۆشی، خەرەفان.

**خڕەفاندن:** خەرەفاندن.

**خڕەفاو:** خەرەفاو.

**خڕەفیاگ:** خەرەفیاو، خەرەفاو.

**خڕەفیان:** خەرەفان.

**خڕەفیو:** خەرەفاو.

**خڕەک** (باک.): لەق، سست، شل، زوورگ، بەردەڵان، شوێنێکە بەردی زۆر بێ.

**خڕەکوچک** (باک.): کوچکە بەرد، خڕ، خڕە، وورده بەرد، چەگل.

**خڕەڵان** (کە.): جێگا یا کەندێکە بەردی زۆر بێ، بەست.

**خڕەڵە:** خڕیلە.

**خڕبوون:** گرد بوون، تۆپەڵ بوونی شوێنێک لە لەش بەهۆی نەخۆشییەکەوە، گلێرە و بوون.

**خڕپ:** دەست بەجێ، گورج، دەم و دەست پتر بۆ خەو بە کاردەبرێ: ـــ خەوی لێکەوت: دەست بەجێ نوست. (کە.) بڕینی چتێکی بەڕێکی و پوختی. (باک.) کرتە، دەنگی بڕینێیە. زەوی جەودار، زیخدار. دەنگی پێیە، کە بە ناو خزی یا بە بندیواریدا بڕۆی.

**خڕپە:** کرتەکرت، خرچ، دەنگی بڕینی دیوارییە، دەنگی پێیە لە دوورەوە، دەنگی لێدانی دڵە، پرخەی خەوی، گەڵەکۆمەگی.

**خڕپەخڕپ:** خڕپە، هەنگاوی بچووک ناویژتنە و دوور ڕۆیشتنە. ووشەیە بۆ پێپەڵکالاَن و جنێو سووکی بەکاردەبرێ.

**خڕپش** (باک.): بە بێ هۆ لە خۆدان و ڕووی خۆ ڕنین.

**خڕپن:** خەپەتۆڵە، قەڵەو.

**خڕپنە:** گپن، گوڕپن، خڕو پڕو قەڵەو، هۆپن، کنک، قوڵەبنە، خریلە، خریلانە، کورتە باڵا، خڕپن.

**خڕپنۆکە:** خڕپن.

**خڕپووک:** گیایەکە.

**خڕپۆ** (باک.): گێل، گەوج، حۆل.

**خڕت:** خڕ، گرد. دەنگێکە. (هەورا.) شەکە نێرێکی یەکسالاَنەی خساوە، تا دووسالاَن، شەکەنێرێکی سێ بەهاری دیتبێ دووایە دەبێتە بەران کە چوار بەهاری دیتبێ. بە گیسکە نێرێکیش دەڵێن کە لە ساڵی دووەمیدا بێ، خەرت. ساڵ: ئەم بەرانە دوو یا چوارـــە. واتە دوو یا چوار ساڵانەیە. کەرستەی خەرتکردن.

**خڕتە:** خرچ، خرپ، خرپە، کرپە، دەنگی بڕین و هەڵپاچینێیە. دەنگێکی گچکەیە وەکوو دەنگی خواردنی مشک. خلە، خەلە، خشە، (هەو.) زەوییەکە لە ساڵێکیدا هەم بکێڵرێ و هەم بچێنرێ، زەوی دووگاسنە.

**خرتەخرت:** خلەخل، خەلەخەل، خشەخش. خرتەی یەک لە دووای یەکتری. (باک.) کرکرۆچکە. دەنگە دەنگی چتی، دەنگی جوولاَنی چتی وورد و ووشکە بە گردی خۆیدا.

**خرتەخرتە:** سووڕان، هەستی ڕۆیشتنی مشک و منداڵ. کرکراگە.

**خرتەک:** پێچکەی عەرەبانە و چتی دی.

**خرتەگل:** خلۆر بوونەوەی چت، گلۆربوونەوە، تلەوبوون، تلواتل.

**خرتەڵە** (هەو.): (هەورا.) خەرتەڵە، خەردەل، گیایەکە وەکوو شێلمی وایە. خڕیلە.

**خرتەنگ** (باک.): دەربەند.

**خرتک:** بەڵغ و خشت و خاڵی بنی کووپە و گۆزە و ئیستر. وێران، کاوول، تەنها بۆ ماڵ و خانوو دەبێ. پێچکە، چەرخ، غەرغەرە. (باک.) ـــ کرن: کەوڵکردن. گرتکەگۆشت. نەخۆشییەکە تووشی منداڵاَن دەبێ. خرکە بەرد. (موک.، کە.) گە، جومگە، جمگە، لە کاتی لە جێ چوونێدا بە کاردەبرێ دەڵێن لە ـــ چوون: لە گەچوون، لە جێ چوون تەنها بۆ چوار پێیان بەکاردەبرێ. جوورە کولەکەیەکە.

**خرتگە:** خرتک، جومگەی ئەندام.

**خرتڵە** (باک.): خرتک.

**خرت و پرت:** دوو دڵی و نیگەرانی لە کارێکیدا. چت ومت، کەل و پەل.

**خرتۆڵ:** کۆبوونەوەی مەردوم.

**خرتووڵە:** چتی خڕ و گردی بچکۆڵە، کردۆڵە.

**خرت و مرت** (ئەردە.): شەلەپەتە، مرۆی خاوو خلیچ، شل و مل، قەڵەو.

**خرت و هۆڕ:** خرتەخرتی زۆر.

**خرتیلانە:** گیان لە بەری خڕیلە.

**خرتیلە:** خرتیلانە.

**خرجڕ** (باک.): شەڕ و کێشە.

**خرچ:** کرچە، دەنگی وورد بوونی ترۆزی و ئیسترە لە ژێر ددانداو، (کە.) خرپە، خرپ، خرتە، کرتە، دەنگی بڕینێیە، خرچە، کاڵەکی نەگەیشتوو و زرک.

**خرچان** (ڕۆژ.، کە.): خرچە، جوورەکاڵەکێکە. تێکەوتن، دۆڕاندن. دۆڕان، تێشکان. (دزە.) پێکان، لە نیشانەدان، نەنگاوتن، خێچان، (شا.) سندەگل و لە تکەخشتی ناڕێک، (هەو.) زەنگوڵ.

**خرچاندن:** پێکاندن، گووێ گرتن بۆ قسەی خەڵک.

**خرچاو:** دۆڕاو، دۆڕاندوو.

**خرچاوی:** دۆڕاوی.

**خرچە:** دەنگێکە وەکوو دەنگی لەتکردنی شووتی، نازاو، کرمە، دەنگی جوویینی خرچە. گرکە، (کە.) خرچان، خرچکە، زرک، قریک، جوورەکاڵەکێکی نەگەیشتووە و شیرینە.

**خرچەخرچ:** خرچەی یەک لە دووای یەکتری، خرچوهۆڕ، ـــی زۆر.

**خرچەکرچ** (کە.): کرتەکرت، دەنگی بڕینێیە.

**خرچەنگ** (باک.): خەرچەنگ.

**خرچک** (دەر.): گرکە، خرچە.

**خرچۆقک:** کێشە، شەڕ و هەرا، پیلە.

**خرخاڵ:** ئاڵقەیەکی وەکوو بازنەی وایە و لە زێڕ یا لە زیو بە پتەوی دروست و لە پێ دەکرێ باریک و ئەستووریشی هەیە یەکێکە لە جوورە خشڵەکانی ئافرەتانە، (زیی.) خشخاش، خاشخاش، خەشخاشی پێ.

**خرخاڵ:** خڕخاڵ.

**خڕخاڵە:** چەند دارێکە وەک بازن لە مسەرەو سەری بێشکە دەکرێ تا خڕەی بێ و منداڵ پێی ژیر بن، خڕخاڵ.

**خڕخاڵەدار:** جوورە بێشکەیەکە هەندێ، ئاڵقەی داری تێخرابێ تا لە کاتی ڕاژاندنیدا خلەخلی لێوە بێ و منداڵی پێ بخافڵێ و بنووێ.

**خڕخڕ** (باک.): خڕەخڕی کەپۆیە یا گەروو لە کاتی نوستنێدا، پرخەپرخ.

**خرخرە** (ئەردە.): خرتک، قرقرە، غەرغەرە. بەرخەبەبە. پێچکەی عەرەبانە و ئوتۆمۆبیلییە، خڕخاڵ، زرزرە.

**خڕخڕک** (باک.): زەنگوڵەی گچکە.

**خڕخڕۆکە** (شن.): گەروو.

**خڕخشت:** خڕوخشت، گردەبڕ، تەواو، تێکرا.

**خرزەک:** خرووزەک، خرووسەک، نەخۆشییێکە، کە گەروو وێکدێنێتەوە.

**خرس**(شا.، کە.، ڕۆژ.): لاسار، سست، دەغەڵ، خەزریو، تەنبەڵ، لەشگران. (فە.) وورچ، هرس.

**خرساندن:** تێ ترنجاندن.

**خرسەک:** کالاّ و سیپالّی قورس. مافوورەی ئەستوور. کوللێرەی ئەستوور.

**خرستیان:** گاوور.

**خرسجر** (باک.): شلووقی، تەقە، هەرا، شێواوی.

**خرسی:** لاساری، تەنبەڵی، دەغەڵی.

**خرفان:** خەرفان.

**خرفاندن:** خەرفاندن.

**خرفانی** (باک.): جوورە هەڵپەڕینێکی کوردییە.

**خڕک** (دزە.): دەستە بەرد، خڕکەبەرد، خڕەبەرد.

**خڕکانە** (کە.): خرکانە، چەند قنچکەیەکە دووایە دەبنە برین و کولک وە چاویلکەی دەچێ تا تەمەنی ٦ساڵی لە بناگوێی منداڵان دێ ئەگەر موورووی داغی پێوەنێن دەری دەکا یا دەیڕەوێننەوە، (هەورا.) خەرکانە، (کە.) خڕکانە.

**خڕکاندن:** کێشان، بخرکینە.

**خڕکە:** خڕک، پەل، کۆپەڵ، خڕەبەرد، دەستەبەرد، بەردێکی پڕ بە چنگییە. نیوەنانێکی ئەستوورە، کە لەسەر تەندوور بۆ خواردن دروستدەکرێت.

**خڕکەخڕک** (سور.): قرخەقرخ.

**خڕکەگازۆڵە** (شار.): یارەڵماسی، پەتاتە.

**خڕکەگازوولکە:** یارەڵماسی، پەتاتە.

**خڕکەڵە:** خەپەتۆڵە، تازە پێ هەڵگرتوو و خڕ و پڕ. چتی خڕی گچکەڵە.

**خڕکردن:** گردکردن، کۆکردن، تۆپەڵکردنی چتێک و خڕهەڵدانی، خڕکردنەوە، گردەوکردن، گرووزەکردن.

**خڕکردنەوە:** کۆکردنەوە، کۆمەڵە پێ کردن، جڤاندن، وەخڕکردن.

**خڕکێش:** خەرەکی بەرد و خشت کێشانێیە.

**خرمان:** بێدەر، خەرمان، کۆی سووری گەنم، بەسەر یەکدا کراوی زۆر لە میوە. *

**خرماندن:** لووشە لووشکردنی ئەسپ و ماین و ئێستر و گوێدرێژانە.

**خرمانن:** خرماندن، کرماندن.

**خرمە** (کە.، هەورا.): کرمەی جۆ خواردنی وولاخانە، کورتەژن، بەدەنگی خواردنی چتی ناسکی وەکو ترێزووش دەڵێن. خرینگە، کوت، دەنگی کەوتنی بارانیە بە سەربانانەدا. دەنگی پێی ئێسترانە.

**خرمەخرم:** کرمەکرم. خرمەی یەک لە دووای یەکتری، دەنگی ووردکردنی نانی ڕەقە لە زاریدا یا کرۆژتنی قەندییە و ئیتر. دەنگی خواردنی مەڕ و وولاخانە.

**خرم خرم:** خرمەخرم.

**خرمژن** (موک.): خرمە و دەنگی کرمەکی ژنانە.

**خرمووتک** (ئەردە.): کورکوروژە، کرکرۆچکە.

**خرمووچک** (ئەردە.): خرمووتک، خرمووتە.

**خەمووشەک** (زا.): چرنووک.

**خرم و هۆڕ:** خرینگە. بە دەنگی پێی دەستە سوارێکیش دەڵێن.

**خرناکە:** بێچووەکەروێشک.

**خرنەق:** بێچووەکەروێشکە.

**خرندال** (زا.): جوورە گیایەکە دەخورێ.

**خرندوول** (زا.): فرۆ.

**خرنک:** جوان و لەبەر دڵ. بەچکە کەروێشک. *

**خرنگ** (باک.): کەروێشکی جحێڵە. ژنی جووان.

**خرنگە:** خرینگە، دەنگی خشڵی ژنان، دەنگی زەنگ و قوڕەی وولاخان. دەنگی داسییە لە کاتی دروێنەیدا، جوورە دەنگێکە وەک دەنگی پاوانە.

**خرنگەخرنگ:** خرنگەی یەک لەدووای یەکتری. ــ ی زۆر.

**خرنگ وهۆڕ:** دەنگ وهۆڕی زەنگ و چتی تر.

**خرنووک:** خەرنووک، سەرپێچ، گیایەکە بە بەرەکەشی هەر دەڵێن خرنووک بەلاّن، کە بەرەکەی ووشک بۆوە مەحچەچەی پێدەڵێن بەرەکەی درێژووکەو تفتە وەکوو گورچیلەیە ئەگەر بە تازەیی و تەڕی بکوترێ و کاتژمێر ونیوێک لەگەڵ زەردێنەی هێلکەی بشڵەقی وەکوو ڕۆتی لێدێ ئەوساڵە سەرپەڕۆیەکییەوە لەسەر چاوی ژاندار دانرێ بەنیوکاتژمێر ژانەکەی دەشکێنی بەرەکەی تام وبەڵغی تووتن لەدەست دێنێ بۆ نەخۆشی شەکریش زۆر باشە ئەو بەڵغەی، کە لەتووتن چنین بەدەستەوەدەنووسی و وەکوو قیلی لێ دەکات، کە بە گەڵای خرنووک بشۆری وەکوو سابوون کەف دەکات وچڵک وبەڵغەکەی دەبات. خاوەند تازەڵیش خرنووکی ووشک لەناو (کۆزی) کارەگەڵدا ڕادەخەن تاجێگاکەیان پیس نەبێ. جوورە بەرێکە لەبەرەکانی دارە مازوو لە مازوو گچکەترە وەکوو خرنووکی وایە.

**خرنووکخرنووک:** جوورەگۆڕانییەکە.

**خرۆش** (هەورا.): خارش، ئاڵۆش.

**خرووش:** ساتەری، حیز، گاندەر.

**خرۆش:** جۆش، گریان، هەراوهۆریایە، کە بەدەم گریانەوە بێ یابێ گریان، خورۆس.

**خرۆشان:** خرووشان، خورۆشان، (هەورا.) هورووژان. ــ ی: خورۆشاندن. ــ ن: خرۆشاندن.

**خرۆشاو:** خووڕۆشاو.

**خرۆشیان:** خووڕۆشیان، خرۆشان.

**خرۆشیاو:** خووڕۆشیاو.

**خرۆشین:** خرۆشان، هووڕۆژان.

**خرو:** هەموتان.

**خرۆک** (هەورا.): گۆ.

**خرووک** (ئەردە.): قدیلکە، ختێ، ختکێ. چاوپێ هەڵنەهاتن.

**خرۆکە** (ئەردە.): خارشت، خرۆش، (کە.) ئالۆش.

**خرۆڵ:** توندوتۆڵ.

**خروو:** خوورو، خارشت.

**خروپر:** قوڵەبنە، قەڵەو و پرپەپێست، (کە.) خرومر. (کرما.) چتمەک.

**خروخەپان:** ئافرەتی قەڵەوی خرخرپن و نەرم وشلە.

**خرووزەک** (شا.): خوروزەک، جوورە دەردێکی گەروو وسینگی مرۆیە دەنگ دەنووسێنێ.

**خرووسەک:** خورووزەک.

**خرووکە** (هەو.): خروێرکە.

**خرومر:** توندوتۆڵ،قەڵەو پرپەپێست، خروپر، قوڵەبنە.

**خروێرکە:** (کۆ.) خرمژ، (هەو.) خرووکە، (زەن.، بابا.، هەورا.) ئاوڵە، (هەورا.) هەڵوێ، (هەو.) خوریکە، (شار.) خروێکە.خروێرکە سێ جوورە. خروێرکەی سفت. ــ ی بلاو. ــ خووێن پژ. چەند زیپکەیەکە هەر کەسێکی لەدەم وچاوی بێت: گرۆیی دەکات.

**خروێرکەی چکۆڵە:** هووری.

**خروێرکەدار:** گرۆێ، ئاوڵاوی، ڕووبخووری. ــ ی: گرۆێیی، ئاوڵاوێتی.

**خروێرکەی بلاو:** ئاوڵەی بلاوە : جوورە ئاوڵەیەکە، کە ماوەی هەڵهێنانی دوازدە ڕۆژە.

**خروێرکەی خووێن پژ:** ئاوڵەی خووێن پژ، خروێرکەیەکی کوژندەیە لە ڕۆژی دووەم یا سێیەمدا لە پەنای ڕان یا مێزەڵاندا پەڵەیەکی سووری گەورە دەردەکەوێ تەشنە دەبێ و هەموو لەشی دادەگرێ.

**خروێرکەی سفت:** جوورە خروێرکەیەکە سەری زوو دەر دەبێ زیپکەی وورد ووردی لێ پەیدا دەبێ، ئاوڵەی سفت.

**خروێکە** (شار.): خروێرکە، نەخوشییێکە تووشی هەموو جوورە گیان لە بەرێکی دەبێ.

**خروێلکە:** خروێرکە، ئاوڵە.

**خروێنکە:** خروێلکە.

**خرهەڵدان:** خرکردنەوە و تۆپەڵکردن.

**خرێ** (کە.): خلێنە، کاکیلە، برێتییە لە چووار ددانە گەورەکانی سەر و خووارەوەی هەردوولا شەویلکانە.

**خرێ** (موک.): نێوی ئافرەتانە. (باک.) ناوی گمە و گاڵتەیەکییە، ناوی گوندێکییە. ناوی خێڵێکی لە ئێلی هەبزینی، هازبنییە.

**خرێف** (باک.): بانگهێشتن و شادمانی بووکهێنانێ، بەزم و ڕەزم و ئاهەنگ، کە دەچنە ناوبەکترییەوە.

**خرێنە** (بابا.): قوڵفەکانی خورجانە. (کە.) کەڵمەی جووتی. (کە.، بابا.) خلێنە. (کە.، بابا.) بەندروو، بەنێلی بادراوی سێ چوار لۆی بادراوە، دوو تا باری پێدەدرێت و لێک قایم دەکرێن.

**خڕی:** گردی، گۆیی. گشتی، تەواوی.

**خریپ:** خرێ، خلێنە.

**خرید:** کڕین.

**خریدار:** کڕیار. ــ ی: کڕیاری.

**خریدنامە:** نامەی کڕین.

**خرێشکە:** ڕەشەبا.

**خریکاندن** (زا.): ڕاکێشانی چت بەسەر زەویدا.

**خریکین** (زا.): پێ هەڵخلیسکان.

**خریلانە:** خرینە، قوڵەبنە، کورتەبالا، خرپلە.

**خرپلە** (دەر.): مرازێکە لە کەرەستەی خەرەکی. (خۆ.) غەرغەرە، (هەورا.) قرقرە، چتی گردو گردیکە.

**خرین** (باک.): خرەخرکردنی گەروو لە نەخۆشیدا، قرخە قرخکردن. بەڵغەم.

**خرینە:** بەنی مووی چەندلۆ بادراوە سەری تای تووتنی ڕەشۆکی پێ دەبەسترێت.

**خرێنە:** خلێنە.

**خرینە** (کە.): خرپلە، کورتە بالا، بەژنکورت.

**خرینگە:** دەنگی خشڵی ئافرەتان و زەنگ و قۆری وولاخانە. (ڕەوا.) دەنگ و قرخەی گەروویە. دەنگ و خرمەی بارانەیە.

**خرینگەخرینگ:** قرخەقرخ، دەنگی نێوسینگی مرۆ و بارانە و داسییە، دەنگی خشڵی ئافرەتانە.

**خرینگ و هۆڕ:** دەنگی زەنگ و قوڕییە.

**خز:** شوێنێ لووسە، کە مرۆی لێ هەڵخلیسکێ. لێژ، سوڕ، سەربەرەوخووار. (باک.) دەنگی برینی چتییە.

**خزاق** (باک.): عەرەبانەی بێ پێچک.

**خزان:** خزین، داخزان، خشان، تێخزان، هەڵخلیسکان. (بۆتا.) هەژار.

**خزاندن:** هەڵخلیسکاندن، خشاندن، خلیسکاندن، تێخزاندن.

**خزانن:** خزاندن.

**خزانی** (بۆتا.): هەژاری.

**خزانێتی** (بۆتا.): هەژارێتی.

**خزە:** لرخە، قرخە. فیتەی جغارەکێشانییە.

**خزەخز:** لرخەلرخ، قرخەقرخ، (هەورا.) خیزەخیز، دەنگی گەرووی مرۆڤانە. فیتەفیتی جگەرەکێشانییە. فیتەفیت.

**خزبردنەوە:** لە بەر قاقای پێکەنینێ بەسەر گازی پشتێدا کەوتن.

**خزخزەکانی** (شکا.): خلیسک.

**خزخزۆک** (باک.): تەرزەڵووکە.

**خزگە:** شوێنێکە گیان لە بەری لێ هەڵبخلیسکێ، سوڕگە، لێژایی.

**خزلک** (زا.): زەنگەترێ، هێشووی گچکەی ترێیە.

**خزم:** کەس، کەس وکار، (هەورا.) خوویش، خنام، (باک.) لیزم.

**خزمانه:** خوویشانە، ئاکار و شێوە و کردارێکە، کە لە خزمان دەوەشێتەوە.

**خزمانی** (باک.): خزمایەتی.

**خزمایەتی:** (باک.) خزماتی، تێکەڵاوی، خنامی، (باک.) لیزمی، نزیکی و کەسایەتی یەکێک لەگەڵ کەسێکیدا.

**خزمە:** لە کووێ وایە. (کە.) خەزێم.

**خزمەت:** ڕاژە، نووده.

**خزمەتچی:** نۆکەر.

**خزمەتکار:** نۆکەر، ڕاژەکار. ــ ی: نۆکەری.

**خزمەتگوزار:** ڕاژەکار. ــ ی: ڕاژەکاری.

**خزم دۆست:** کەسێکە نرخی خزمایەتی و دۆستایەتی بزانێ. ــ ی: خۆشویستنی خزم.

**خزم وکار:** کەس وکار.

**خزن** (ئەردە.): کەڵەک، بەردچن، قسن.

**خزنە** (ئەردە.): خزندە.

**خزندە:** ئەو جانەوەرانەن، کە دەخزێن و دەخوشن وەکوو مار و کرم و زەروو.

**خزیان:** خزان، خزین، چوون یا هاتن بە هێواشی بە بێ هەست. خوشین، خزین، خزان.

**خزیلک:** شوێنی خز.

**خزێم** (باک.): خەزێم.

**خزین:** خزان، داخزان، تێخزین، خوشین، داخزین، خشان، هەڵخلیسکان.

**خزێو:** هەڵخلیسکێن.

**خزیو:** خوشیو، هەڵخلیسکاو.

**خزیلکە** (هەورا.): خلیسک.

**خساره** (کە.): کاریتە.

**خستران:** خزان، کەوتنە سەرزەوی.

**خستراو:** خراو، کەس یا هەر زیندەوار و چتێکە خرابێتە سەرزەوی.

**خستن:** ئێخستن، کەواندن، بە زەوی دادان، خەوخاندن، فڕێدان، (هەورا.) ڕووستەی، وەتن. لە کار ــ : بێکارکردن، دەستەڵات لێ ئەستاندن، زە بوونکردن، شکاندن. نەخۆش ــ : ناساخکردن، ژێ ــ : لێ جیاوێ کردنەوە. بە کەسێک دۆڕاندن، پێدۆڕاندن، تێ ــ : تێ ئاویژتن، تێنان. (ئەردە.) دابەشین، دابەشکردن.

**خستنەجێ:** خستنەوەجێ.

**خستنەخووار:** بەردانەوە، ووزەشەڕە، وەرسیاندن.

**خستنەدەشت:** دەرخستن، ئاشکراکردن.

**خستنەڕێ:** وەڕێ خستن، بەڕێ کردن.

**خستنەژێر:** وەژێرەوەخستن، لەبنەوە دانان.

**خستنەسەر:** بەدەمەوەدان، مەیدان دان.

**خستنەکار:** وەکارخستن، وەکارخستنەوە؛ چاپخانەی کوردستانم وەکارخستەوە.

**خستنەگەڕ:** خستنەکار.

**خستنەوە:** زایین و خستنە گێتی چەند منداڵێک، دارا منداڵی زۆر خستەوە: واتە منداڵی زۆر بووە. (ئەردە.) دروستکردن، بەرپاکردن.

**خستنەوەجێ:** خستنە جێ، دووبارە لە جێگای خۆی دانانەوە. تۆڵەدانەوە، چتێکی تر لە جیاتی وی دان یا دانان.

**خستنەوەکار:** وەکارخستنەوە.

**خسکە** (شار.): قیسکەپیواز، قسقە، سەلکە پیوازی وورد. ترێزوو و خەیاری گوڵبەدەم.

**خسن** (هەو.): قسن، شوورە.

**خشن:** خشە، خشپە، هەستێکی لە سەرە خۆیە.

**خشا** (ئاوێ.): بریسکانەوە. فەرمانکردن، تێڕاخوڕین. خوشی.

**خشان:** سووڕان، کشان، لێ خشان، خزین، خزان.

**خشانەلاوە:** نزیک کەوتن، ناپاکی و بەدئەکی و سپڵەیی کردن. لادان، وەلاکەوتن.

**خشاندن:** کشاندن، سوونەوە، خەشک کرن. لێ ــ . پێ لێ ــ : وازلێ هێنان، بەخشین. بەسەر زەویدا خشاندن و ڕاکێشان.

**خشانن:** خشاندن.

**خشە** (شن.): چەمۆڵە، ــ پێگرتن: چەمۆڵە لێ نان. خلە، خەلە، خرتە، خشپە، چرپە، هەست، چپە، چەپە، خشەخش. دەنگێکە وەک دەنگی ڕاکێشانی چتێکی نەرم بە سەر زەویدا، خوشینی مار یا مشک بەسەر زەویدا.

**خشەئینتە** (ئاوێ.): سەردار، فەرماندار، تروسکەدار، برووسکەدار.

**خشەخش:** خرتەخرت، خپە خپ، چرپەچرپ، چقەچق، خلەخل، خەلەخەل، خشە، خشپەخشپ، چەرقین، خش وهوڕ، دەنگی جووڵانی تەڵاس و کاڵای تازە و چڵ و ئیترە.

**خشەودای وەنە** (هەورا.): خشەی لێکدان.

**خشپە:** خشە، هەستێکی سووکی ڕۆیشتنییە، خشەییکی بچکۆڵەیە، کە لە چتێکەوە ڕوویدات، کە نەبینرێ، خرنگە، هەستم بە ــ یەکی کرد. هەستی جووڵانی زیندەوار و ئیدیکەیە.

**خشپەخشپ:** خشەخش، هەست و خوست.

**خشپن**(کە.): کورتە باڵا، قوڵەبنە، قەڵەو.

**خشپیلانە:** گیانداری نەشمیلانەی ئێسک سووک.

**خشپیلە:** خشپیلانە.

**خشت:** خڕ، جغزی خڕ، چتی گرد. (باد.) زەرگی دەروێشان. ڕێک و پێک، (هەورا.) خشتە، تەخت، یەکسان. تەواو، گشت، خڕ، هەموو. قوڕێکی لە قاڵب دراوە بە کاڵی یا بە سوورەوە کراوی بۆ دیوار و شوێنانی تر بە کار دەبرێت. ــ ی سوورکراوەوە: کەرپووچ، کەلپیچ. ــ ی کاڵ: لگبن. (باک.) شیشەی کەبابییە.

**خشتاوێژ:** کەسێکە لە کارگەران، کە خشتی بۆ وەستا بهاوێژێ بۆ دیوار و چتی تر دروستکردن.

**خشتە:** بن، ڕەچەڵەک. لە ــ بردن: تەفرەدان، فریودان، دەست بڕین، قۆڵشکاندن، شۆپکردن، هەڵفریواندن. لە ــ چوون: تەفرەخوواردن، تەفرەدران. نیوە هەڵبەست.

**خشتەک**: پارچەیێکی گچکەیە دەکەوێتە بن هەنگڵی کەواو کراس و ئیترەوە. (ڕەوا. ، کۆ.) گرۆڵ، پارچەیێکە لە کراس یالە کەوادا.

**خشتەنداز**: کەسێکە خشتی بۆ وەستای سەر دیواری باوێژێ.

**خشتبڕ**: کەسێکە خشتی ببڕێ واتا خشتساز بە قوڕ و قالب. قالبێکە خشتی تێدا دادەڕژێ.

**خشتبڕین**: خشت لە قالب داڕژتن، خشت دروستکردن.

**خشت بوون**: ڕێک بوون، دەغڵە کە خشت بووە، واتە هەموو گوڵەکانی ڕێک وەستاوون.

**خشت خشت** (باک.): خشەخش، خلەخل. ڕێک و پێک.

**خشتک** (ئەردە.): گرۆل، پارچەیێکە لە بنهەنگڵ دەدرێت.

**خشتکان** (باک.): خوران. ـــ دن (باک.) خوراندن، ڕنین.

**خشت کردن**: قرتاندنی چت بەڕێکی. ڕێک کردن، ڕێک و پوخت کردن.

**خشت وخاڵ**: خشت و خۆڵ و زبڵی ماڵ و دووکان و کۆڵان و ئیدیکەیە، زبڵ. لیشمە، چرپ و چاڵ، تڵتە و خڵتەی شلەمەنییەکە، کە خۆی لە بنی نیشتبێ یا پاڵێورابێ.

**خشتوور** (شن. ، هەو.): وێران.

**خشتێ**: نێوی ئافرەتانە.

**خشتی**: ڕێکی، قشتی. چوارگۆشە.

**خشتیلانە** (موک.): خونجیلانە، (موک.) قنجیلانە.

**خشتیلە**: چکۆلە و جووان، ژیکەڵە، قشتیلە، (باک.) خەمشۆک.

**خشخاش** (زیی.): خڕخاڵ. (باد.) شەقشەقە.

**خشخشۆک**: خلیسکێن.

**خشخشە** (کە.): هەزار پێ.

**خشر** (باک.): خشڵ، چەک.

**خشرووک** (زا.): خەرکانە.

**خشک** (ئەردە.): هەزار پێ، (ئەردە.) خشی.

خشکە

**خشکاندن** (باک.): خلیسکاندن، هەڵخلیسکاندن.

**خشکە**: خێچک، خلیسکە لەسەر بەفری یا سەهۆڵی. (ئەردە.) خشک. فڕینی باڵندە بە نزمی و لە نزیک زەوی. (ئەردە.) دەنگێکە لە خشانی چتێکەوە پەیدا دەبێ، قوونە خشکە، قنگەخشکە.

**خشکەیی**: ڕۆیشتنی چتە بە حەوادا بەومەرجە کە نزم و لە زەوی نزیک بێ، پەڕەسلێرکە بە ـــ فڕی. ڕۆیشتنی گیاندار بە بێ هەست و بە توندی.

**خشکۆک** (باک.): بەبە، منداڵی ساوا. (شەم.) قشت و جووان، خوشکۆک، (زا.) هەیف، بۆ ژن و کچ و منداڵی جوان بە کار دەبرێ. (سور.) خلیسکگە، جێگای خلیسک.

**خشکێ** (ئەردە.): قوونەخشکێ.

**خشل** (باک.): دارێکە.

**خشڵ**: چەک، ڕەخت، گوولی، خشر، زیوەر، (باک.) پۆخک، خەمڵ. نێوی ئافرەتانە. چەکی ئافرەتانە، ئەوا لە خووارەوە بە ڕێزە دەیانخەمە بەرچاوانەوە، کە هەریەکەی لە شوێنی تایبەتی خۆیدا ڕوونکراوەتەوە: بازنە، بلبلە، پاشەسەر، پشتێند، پێشەسەر، تاس، تەزبیح، چۆچە، حەلقەنەنگوست، خەزێم، خەشخاش (خاشخاش)، خڕخاڵ، دوگمە، دوگمە و دۆڵاب، زەنادی، زرشەمشە، سنجاق، سینەبەند، عاشق بەند، قەتارە، قەنەفل بەند، قۆتاسە، قۆڵبەند، کەمبەرە، کرمۆکە، کلاو بەدراو، گەردانە، گەردەنلغ، گۆ، گوارە، گۆیەرۆک، گێل گێلە، هەیاسە.

**خشڵ وورەش** (هەورا.): خشڵ فرۆش.

**خشنای** (هەورا.): خشاندن.

**خشندە**: گیاندارێکە لە سەر زگ بڕوات وەکوو کرم و مارو ئیتر.

**خشۆک**: خشندە. شەمەنەفەر. ئوتۆمۆبیل، پێفرک.

خشۆک

**خشوپش** (کە.): هەوڵدانێکی کەمە بۆ کارێکی.

**خشی** (لو.): هەزار پێ.

**خشیان** (ئەردە.): خشان، خزان، کشان، خوشین.

**خشین**: خشان.

**خشینەک** (زا.): شوێنی ڕاکێشانی چتە بەسەر زەویدا.

**خفتان** (باک.): کەوا. هەوڵدان.

**خفتەوبێدار**: خەوتوو و بە ئاگا.

**خفتەوڕاسە**: نوستوو و ڕاست بوونەوە.

**خفشک** (باک.): کارمامزی یەکسالانەیە.

**خگ**: لێدانی کوژندە.

**خل**: خلۆر، خول، خوولۆر، تل، گل. ـــ بوونەوە: تل بوونەوە. ـــ کردنەوە: تل کردنەوە.

**خلاف** (ئەردە.): خاو، خاویان.

**خلافان**: خەریک بوون. تەفرەخوواردن. ـــ دن: خەریک کردن. تەفرەدان، هەڵخەڵەتاندن، خلەفاندن. ـــ ن: خلافاندن.

**خلان**: تلان، خولۆر بوونەوە.

**خلانە**: چاڵێکە میوەی وەکوو پورتەقاڵ و لیمۆی تێدا دادەپۆشرێ و هەڵدەگیرێ.

**خلانکە**: خڕخالی بێشکە.

**خلە**: خشە، خەلە، خرتە. (ئەردە.) کورتکراوەوەی(خلیل)ە.

**خلەتان**: هەڵخەڵەتان، فریوخوواردن. ـــ دن: فریودان. ـــ ن: خلەتاندن.

**خلەتیاگ**: خەڵەتاو، تەفرەدراو.

**خلەخل**: خشەخش، خەلەخل، خرتەخرت. ووتەیەکە بە کاردێنرێ بۆ گێڕانەوەی ڕۆیشتنی منداڵی تازە پێ هەڵگرتوو. ئازاد کەوتۆتە سەر پێیان بە خلەخل دەڕوات.

**خلەف** (ئەردە.): تێکوڵ. کاسە، قۆزاخە.

**خلەفان**: خەرفان. تەفرەخوواردن. خەریک بوون بە کارێکەوە بۆ کات بردنەسەر. ـــ دن: خەریک کردنی کەسێک بە کارێکەوە.

**خلەفاو**: خەلەفاو، خەریک.

**خلەوبوون**: خلبوونەوە، تلەوبوون، گلەوبوون.

**خلبوونەوە**: خلۆر بوونەوە، گلۆربوونەوەی چتێک لە شوێنێکی لێژەوە.

**خلت** (باک.): مشکەکوێر.

**خڵت** (ئەردە.): خڵتە.

**خڵتاندن** (ئەردە.): هەڵفریواندن، گوڵدان، گوڵ لێدان، تەفرەدان.

**خلّتانن:** خلّتاندن.

**خلّتە:** خەش، خروش، تلّتە، خشت و خالّ، تلّتەیێکە دووای پالاّوتنی چتی شل دەمێنێتەوە، بە تلّپەی میوەش دەلّێن، ــ ی ڕۆنی: گرک. ــ ی سەبیلە و مۆدنە: (کۆ.) قیرقەننە، زاخ، ژار، شیلیاقەلوونیّ.

**خلّتیاگ** (ئەردە.): فریو خوواردوو، گولّدریاگ، گولّ لێدریاگ، خاویاگ، فریبیاگ.

**خلتی تەلاّ:** خلّتە زێڕ.

**خلچ** (باک.): (باک.) علچ.

**خلخال** (فە.): خرخالّ.

**خلساندن:** خلیسکاندن، هەلّخلیسکاندن.

**خل کردنەوە:** گلۆرکردنەوە.

**خلماش** (باک.): بیرەخەو.

**خلنزەر** (زا.): مارمێلکە.

**خلۆر:** خۆل، گلێر، تل، خل، خولۆر، (باک.) بالۆر، (ڕەوا.) بانگرۆز، گلۆر، تۆزیلانە. باگلۆر، بانگلۆر، بانگلۆز، گروز، بانگوڕ، بانگێڕ.

**خلۆربوونەوە:** گێربوون، گیزین، کل بوونەوە، تل بوونەوە، گرۆز بوونەوە، گلان، قنگە و تلوور بوونەوە، قوونەوتلوور بوونەوە، خل بوونەوە.

**خلۆرتە** (هەورا.): بالّینەیەکە لە ژێر کورتانییەوە لە پشتی وولاّخ دادەنرێ بەولاولایەوە تا بار نەنیشێتە سەر کولّۆکی وولاّخەوە.

**خلۆرکردنەوە:** گندراندن، گلاندن، ڤرڤراندن، گل کردنەوە، تۆزیلانەکردن، ڤەرووتاندن، خلکردنەوە.

**خلوورلیک** (زا.): تەرزە لّووکە.

**خلیّ** (ئەردە.): وەکوو نۆنە وایە منداڵان بە مێوژ و برێشکە و شەکرۆکە دەلّێن، قەقە، ققە.

**خلیانەوە:** خلۆربوونەوە، تلۆربوونەوە، تلیانەوە، گلیانەوە، تلەوبوون، خلێرەوبوون.

**خلێران** (ئەردە.): تل خوواردن، گل خوواردن، تلیانەوە، گلیانەوە، تلەوبوون.

**خلێرە:** وولێرە، خولێرە، زریزانە، چتێکی ڕەش و زەرد باو و خڕە لە ناو گەنمدا وەکوو مرۆر پەیدا دەبیّ، گلێرە. (ئەردە.) چتی گردی گلّۆلە. (ئەردە.) وولێرە، گیایەکە، داردەست. هەڕلە، زیندەوارێکی گچکەیە و لە مێش گەورەترە وەکوو مووروو خۆی خڕ دەکاتەوە، کە بڕوات، درێژکارە و وەکوو هەزار پیّ پێی زۆرە.

**خلێرەخلێرە:** گلێرەگلێرە، گردگرد.

**خلێرەوبوون:** خولۆر بوونەوە، گلۆر بوونەوە، گردبوونەوە، تلێرەوبوون، تلەوبوون.

**خلێرەوکردن:** خولۆرکردنەوە، تلۆربوونەوە، گردکردنەوە، گردەوکردن. خڕکردن، گردەوکردن.

**خلّێف:** کەندووی مێش هەنگوینییە، (باک.) هەنگخانە، گوورییە، بەرگاز، گوورێک. کالان، کێلان، بەرگی خەنجەر و شیرییە. توویێژ و تووێک و کاژێکە، کە لەشی گیاندار هەلّیدەدا. (باک.) پێلّوو، پەلکی چاو، (باد.) پێچدان و پێچ خوواردنی مار.

**خلێنە:** خرێنە، بەنی مووی ڕێسراوی سیّ چووار لۆی بادراوە. خریّ، خرێنە، هاروو، کوورسی. (ئەردە.) ماکینەی ماستاو گرتنەوەیە. پێسی ئاژاڵانە، کە بە پاشلّیانەوە ووشک بووبێتەوە، کەمێلّە، گنجی.

**خلێنەوبلێنە:** تەگبیر و ڕایە، کە چەند کەسێک بە نهێنی بیکەن بۆ پێکهێنانی کارێک، ساز و باز.

**خلێنکە:** قالۆچەیێکی زلی دەشتییە شیاکە بە خڕی خل دەکاتەوە بۆ ناو کونەکەی بۆ خوواردنی.

**خلیچک:** خاو، سستەپەلە.

**خلیرە** (ئەردە.): جوورە دانەوێلّەیەکی ڕەشی زەرد باوی خڕە.

**خلیسک:** قیسکەپیواز. (باک.) خیز، گەمەیەکە لە سەر بەفرو سەهۆلّ خۆ هەلّدەخلیسکێنن یان لە هەر شوێنێکیدا، کە بۆ ــ دەست بدات، (فە.) سووڕسووڕەکی. جیگایەکە لە سەر بەفر یا سەهۆلّ یان شوێنێکی تەڕ یا هەورازدا، کە خلیسکی لە سەر بکریّ یا مرۆی لە سەر هەلّخلیسکیّ.

**خلیسکان:** هەلّخلیسکان، تەهسین، خشکین، قەکرین، هەلّخزان. ــ دن: هەلّخلیسکاندن، خشکاندن، تەهساندن، خلساندن، هەلّخزاندن. ترشاندن.

**خلیسکاو:** تەهساو.

**خلیسکە** (خۆ.): قیسکەپیواز، (بابا.) فیسقە.

**خلیسککار:** (باد.) تەهیسەک، (هەورا.) خشیلک کار. ــ ی: خلیسک کردن.

**خلیسکگە:** جێگای خلیسک لیّ کردنیّ، خشکۆک، شەمشەمۆتک.

**خلیسکیان:** هەلّخلیسکان، خزیان، سوڕیان.

**خلیسکێن:** (هەو.) خشخشۆک، گەمەیەکە لە سەر سەهۆلّ یا بەفر یا شوێنی تەڕ.

**خلینە:** دار یا ئاسنێکی سیّ پەلە ماستاوی پیّ ئەکریّ.

**خم:** هەش، (کە.) خوم، لیلەنگ، ڕەنگێکی شین یا ڕەشە بەن وکالاّی پیّ ڕەنگ دەکریّ.

**خمار** (باک.): سەر پۆشی ژنانە.

**خمەڕێژە** (بابا.، هەورا.): گۆڕەوی چنە (بالّندە.).

**خمەگەڕوو:** قومقومۆکە.

**خمتین** (باک.): کونگرتن، بە گرتنی کونان دەلّێن ساهەر کونێکی بیّ.

**خمچی:** خومچی، خمخانەچی، وەستایەکە کەل وپەلی لە خم بدات.

**خمخانە:** خومخانە، شوێنێکە چت و کەل وپەلی تێدا لە خم بدریّ.

**خمخم:** منگن، (باک.) منگن. تفنک.

**خمخمک** (باک.): کونەلووت.

**خمخۆرک:** درز و قەلّەشتی زەوی، (کۆ.) کەندێکی قوولّە، کە ئاو قوولّی کردبیّ بەو مەرجە قولّکەو کەندێکی سنوور داربیّ و زۆر گەورە نەبیّ، بە شوێنێکیش دەلّێن لە زەویدا، کە لە خۆیەوە ڕۆچوو بیّ.

**خمرەشۆک** (هەو.): خەمرەشۆک.

**خمرێژە:** خومەڕێژە، بالّندەیێکی سەوزی جووانە لە کەندەسمە گەورەترە و بەقەد کۆترێکی دەبیّ.

**خم شێوان:** مەبەس لە بیستن و بڵاو بوونەوەی درۆیەکی زلی دوور لە ڕاستی و بیر و ژیری. کاتێکە درۆی زلی تێدا بڵاوبێتەوە.

**خمگەر:** خمخانەچی، خومگەر.

**خمۆر** (باک.): بزنێکە مووی سەری زەردێکی خورمایی بێ.

**خمی:** خومی، ڕەنگی خمی.

**خن** (باک.): جوان.

**خناف** (بابا.): شەونم.

**خنام** (باک.): خزم لە ڕێگای ژنانەوە. ـــ ی(باک.): خزمایەتی لە ڕێگای ژنانەوە.

**خنانەوە:** جوورە پێکەنینێکی نەرمە، ئازاد لە خۆشیان خنایەوە.

**خناوی** (کە.): خەناوی.

**خنە** (کە.، فە.): خەنە، (ئەردە.) خنەخن، سنگەسنگ، سەرگەرمی.

**خنەخن:** دامان و نقاندن بە دەست کارێکەوە، ڕۆستەم بە کارەکەیەوە ـــ یەتی، سەرگەرمی.

**خنج** (ئەردە.): ڕێک وپێک، خنجیلانە، خنج و منج.

**خنجەبڕ** (کە.): بەرێکی براو. ڕێک براو.

**خنجەر** (باک.): خەنجەر.

**خنجەرە** (ئەردە.): کێڵێکە لە بەردەمی گۆڕی مردووان دەچەقێنرێ بۆ ئەوەی، کە بزانرێ، ژنە یا پیاوە.

**خنجەڵە:** خنجیلە.

**خنجکە** (ئەردە.): ناز، گریشمە.

**خنج و خۆڵ** (ئەردە.): چتی جوانی خنجیلانە، خنج و منج، نازەنین.

**خنج و مج:** قشتیلە و جوان.

**خنج و منج** (ئەردە.): خنج و خۆڵ.

**خنجیلانە:** قشتیلانە، قشت و جوان، ڕێک و پێک، چکۆلە و ئێسک سووک.

**خنجیلە:** نەشمیلە، قشتیلە، جوان و گچکە.

**خنچ:** جوان، قەنج، قنج.

**خنچکە** (ئەردە.): خنجیلانە.

**خنخنک** (باد.): تفنک، کونەکەپۆ.

**خنس** (خۆ.): نادیتە، کەم دیتە. (خۆ.) زۆر چرووک، چەتوون، سەخت.

**خنک** (ڕەوا.، خۆ.): مرۆی مل و گەردن کورت.

**خنکان:** فەتسان، فەتسین، (ڕۆژ.، هەورا.) تاسان، (هەورا.) خنکنای، مردنی گیاندارە لە ئاودا یا لەبەر پشوونەهاتنی.

**خنکاندن:** (ڕۆژ.، هەورا.) تاساندن، فەتساندن. لە سێدارەدان، لەداردان. کوژتنی کەسێک لە ئاودا یا بە هەناسە بڕینی.

**خنکانن:** خنکاندن، تاساندن، خەفەکردن.

**خنکاو:** (ڕۆژ.، هەورا.) تاسانراو، کەسێکە لە ئاودا یا بە هەناسە نەهاتن یا بە سێدارە کوژرابێ.

**خنکیان** (ئەردە.): خنکان، تاسان، خەفەبوون.

**خنکیای** (هەورا.): خنکان.

**خنگار** (باک.): هاڕین، ووردکردن. ـــ بوون: هاڕران، ووردکران. ـــ کردن: هاڕین، ووردکردن.

**خنگرین** (باک.): بە دڵنیایی و سوپاسەوە ڕۆیشتن.

**خنگلین** (زا.): شەلین.

**خنۆ** (باک.): خوناڤ، خوناو. ناوی ژنانە.

**خنۆک** (خۆ.): تەنبەڵ، کارنەکەر.

**خنووس:** خونس، شارێکی کوردانە لە ژووری کوردستانێدا لە ژێر دەستی ترکاندایە.

**خنیە** (لو.): خەنە.

**خنینەوە:** خنانەوە.

**خنێس** (باک.): ناوی چۆمێکییە، شاری(نوسەیبین) لە نزیک وییە، چۆمەکە لە ڕۆژاوای (نوسەیبین) یێیە.

**خنێکیای** (هەورا.): خەفەبوون.

**خنین:** ئاخنین.

**خۆ** (باک.): خووا، خووێ، خورت، (باک.) خۆرت. مرازی کەسێتی، وێ، هوویژ، خووە، بەڵام بەتەنها بەکار نابرێ لەگەڵ ڕاناوان دەخرێ: خۆم. وێم، هوویژم، خۆمان: وێمان، هوویژمان. بۆخۆی: بخووە، لە ـــ ڕادیتن: لە خۆڕابینین، لە خۆڕاپەرموون، بە ـــ داهاتن: خۆ نوواندن، ژ ـــ : لە خۆڕا، لە ـــ گرتن: وە ملی خۆگرتن، لە سەر بە پێویست زانین. زوێر، توورە، دڵی وی لە خۆکردن: واتە دڵی وی زوویرکردن. ئاشناو ناسیاوی تێکەڵ. ئایا، ئەرێ. ـــ نایەوێ: ئایا نایەوێ، هۆش: لە ـــ چوون، بێ هۆش بوون. بەڕاستی، بێ گومان، خۆ لە گەڵم دێیە سەر دەشتی: بە ڕاستی لە گەڵم دێی. ئەگەر، کە، خۆکە نەیەی ئیتر گلەیی مەکە: ئەگەر نەیەی ....، بۆ سەر کۆنەو سەرزەنش بە کار دەبرێت: خۆتۆلای خۆت پیاوی !؟!.

**خۆبان:** ناهومێد، هەویا براو.

**خۆبەخنکردن:** خۆ کردنە قوربانی، خۆ کردنە گاوو گەردوون، خۆ لە پێناونان.

**خۆبەردان:** برێتییە لە پتر خەرجکردنێک، کە لەوە پێش نەتکردبێ.

**خۆبەدەستەوەدان:** خۆ دانە دەست.

**خۆبەزەوییدادان:** (ئەردە.) خۆبە زەویندان.

**خۆبەس** (ئەردە.): درۆ، هەڵبەست.

**خۆبەستن** (ئەردە.): خۆگرتن، دەوڵەمەندبوون.

**خۆبەکەم زان:** وێش بە گولانە زانوو.

**خۆبردنەپێشەوە:** خۆڕەپێش خستن، خۆ خۆشەویستکردن، بەکردەوە یا بە کوتنی چتێک بە پێی دڵی یەکێک.

**خۆبرۆ** (هەو.): جوورە گەمەیەکی منداڵانەیە لە تۆپە ڕاکردنێدا.

**خۆبڕین:** لە خۆدان، بە سەر و پۆتراکی خۆدادان، خۆ کوژتن.

**خۆبوواردن** (خۆ.): خۆتەنبەڵ و تەپکردن.

**خۆبین:** خووەبین، بەفیز، فیزدار، خۆپەسند. ـــ ی: فیزداری، خۆپەرستی، خووەبینی، خۆپەسندی.

**خۆپارازتن:** خۆ دوورگرتن و خۆپارازتن لە چتێک، پارێز کردن.

**خۆپارێز:** کەسێکە خۆی لە شەڕوو کێشە و دەردەسەری و چتی تر بپارێزی، پارێزگار. ـــ ی: پارێزگاری.

**خۆپان** (زا.): کەلاوە، خراپە، (باک.) خۆ پانۆ، وێرانۆ، کاولۆ، کاڤلۆ.

**خۆپەرس:** خۆپەرست، خۆپەسند. ـــ ت: خۆپەرس، کەسێکە زۆر خۆی پەسند بکات و بە خۆی بفشێ. ـــ ی: خۆبینی.

**خۆپەسەن:** خۆپەسند. بایی، خۆبین، (جەبا.، رِژ.) بافەدەنگ. ـــ دی: بەخۆفشین، خۆپەسندی.

**خۆپەسن:** خۆپەسند. ـــ د: خۆپەسەند. ـــ دی: خۆپەسەندی.

**خۆپەسنی:** خۆپەسندی.

**خۆپۆش:** کەسێکە شەرم بکات یا خۆی داپۆشێ. ـــ ان: خۆداپۆشین.

**خۆپۆشاندن:** خۆداپۆشین، خۆپەنهانکردن.

**خۆپۆشانن:** خۆپۆشاندن.

**خۆپێچدان:** پێچ خوواردن.

خۆپێچدان

**خۆ پێوەکردن:** خۆ تووشی رووشەکردن، خۆ پێوە هەڵاوەسین، خۆ پێوەهەڵکێشان.

**خۆت:** مەبەس لەوکەسەیە، کە لە گەڵی داخووێی.

**خۆتا:** خۆتدا، چتی وا لە خۆتاگومان دەبەی.

**خۆتان:** مەبەس لە وانەیە، کە لە گەڵیان دا خووێی.

**خۆتە:** لە کاتی مەڕ و بزن دۆشینێدا بە کاردەبرێ، تاراوەستن.

**خۆتەن:** بەنەزانی.

**خۆتراش:** خودتراش، ماشینی ریش تاشینییە.

**خۆترە** (هەو.): دارێکی قوڵە و ئەستوورە وەکوو کوتکی بە کاردەبرێ، (هەورا.) قۆتەرە.

**خۆتێگەیاندن:** خۆ لێ نزیک کردنەوە، ئاوور لێدانەوە.

**خۆتێگرتن:** خۆ لە کار و بارۆ یا کێشەیەکە وەدان بۆ سوود لێ وەرگرتنی.

**خۆتێهەڵقوتاندن:** خۆ تێهەڵقورتاندن، خۆ تێکەڵ بە کار و باری ئەم و ئەو کردن.

**خۆجا:** خۆجێ.

**خۆجێ:** بەڵەد، شارەزا.

**خۆجێیەتی:** هاو وولاتی، جهزایی، شارەزایەتی.

**خۆجێ یی:** جهزایی، بەڵەدی، هاو وولاتی.

**خۆچک** (باک.): خوشک.

**خۆخ:** هەشتاڵوو، (هەورا.) هەشتاوی، قۆخ.

**خۆخەڵەتاندن:** خۆنەزان و ناشی کردن.

**خۆخستن:** خۆ کەواندن، خۆفرێدانەخووار.

**خۆخلافاندن:** خۆ بە چتێکەوە خافلاندن، سستی کردن.

**خۆخلافانن:** خۆ خلافاندن.

**خۆخلافکێ:** خۆخلافاندن.

**خۆخۆر:** کەسێکە زیانی بۆ ناو خۆ ببێ.

**خۆخوراندن:** خوراندنی لەشی خۆ. مەبەسیش لە خۆ ئامادەکرد بۆ بە خشینی چتێکی.

**خۆخوراندنەوە:** دووبارە خۆخوراندن.

**خۆخۆر:** کەسێکە لە گەڵ ئەم و ئەو بەدو خراپ بێ. ـــ ی: بەدی لەگەڵ ئەم و ئەو کردن.

**خۆخۆڵی:** عووعە، چتێکە منداڵی پێ دەترسێنن.

**خۆخووا:** خۆپەرست، خۆپەسند.

**خۆخووەردان:** خۆبەرخۆرخستن، لەبەر بەرۆچکە دانیشتن.

**خۆخوواردنەوە:** پێشخوواردنەوەو رِق خوواردنەوە. چکانەوەی چێشت لەبەر زۆرکولانی. شێ وەرگرتنی زەوی لە کاتی ئاوخوواردنەوەدا بەجوورێکی وا، کە ووشکی تێدا نەمێنی. پێچ خوواردن، خۆپێچدان، پێچ لە خۆدان.

**خۆدار:** ددان بەخۆداگر. ـــ ی: ددان بەخۆداگرتن، پارێزگاری، خوداپەرست.

**خۆداکوتان:** مەبەس لە خۆدامەزراندنە.

**خۆداگرتن:** خۆحەشاردان بۆبیستنی ئاخۆتنی ئەم وئەو.

**خۆداگیرکردن:** ددان بەخۆداگرتن، خۆراگرتن.

**خۆدانان:** خۆلەپێناودا دانان و بەخت کردن.

**خۆدانەدەست:** خۆبەدەستەوەدان.

**خۆدانووساندن:** خۆگرتن، خۆلەکەمێن نان، خۆداگرتن.

**خۆدزینـەوە:** خۆگرتن، خۆپەنهانکردن، خۆشاردنەوە. گـووێ گرتن لەپەنایەکدا.

**خۆر:** ووشەیێکە بەدووای هەرناوێکەوە بنووسێ دەیکاتە ناوی بکەر وەکوو: گۆشتخۆر، نانخۆر، خووەر. رِۆژی ئاسمان، تاو، هەتاو، (هەورا.) هوورێر، وەر.

**خۆرا:** زۆر خۆر، بخۆر.

**خۆرِا:** خۆرِایی.

**خۆراک:** خوواردەمەنی. گێرمی. (شەم.) خووری. (هەورا.) واردەمەنی. بەشی جارەخوواردنێک. ـــ یک چا: تێرای جارێکی چایی ووشک. ـــ یک دەرمان: بەشی جارێکی دەرمان.

**خۆراکی** (ئەردە.): خوواردەمەنی.

**خۆراگر:** (خۆ.) بارقوڵ، بەپشوو، پشوودرێژ. ـــ ی: پشوودرێژی.

**خۆراگرتن:** ددان بەخۆداگرتن لەبەرچتێکی ناخۆش.

**خۆرانان:** خۆنیشاندان، خۆنوواندن.

**خۆرانگاز** (هەو.): شوێنێکەلە لەش کە تیشکی خۆر سووتاندبێتی. هەتاوبردوو. ـــ بوون: هەتاوگازبوون.

**خۆراوا:** رِۆژاوا. شوێنی رِۆژاوایە. کاتی رِۆژاوایی، ئێواری.

**خۆراوایی:** رِۆژاوایی، کەسێکە لە خاکی رِۆژاوایەدا لەدایک بووبێ.

**خۆرِاوبۆرِا:** خۆرِایی. بەلاشی.

**خۆرِایی:** فیرِۆ، چتی بێ پارە، مفت، هەروا، خووڕایی.

**خۆرە:** (باک.) خوورک، ژەنگ. (دەر.) خۆرِەسەرە، خۆرک، خۆرکە، مافەتە، (باد.) خێرک، ئاپۆرە، ئاپۆرە لە سەری تەدا: خۆرەت لە سەری دا، برینێکی پیسە و زۆر بە خارشتە و چابوونەوەی دژوارە. جوورە برینێکە بە هەرشووێنێکی بگات دایدەوەشێنی و چابوونەوەی نیە.

**خۆرەبووک** (سور.): نۆکێکە لەناو زیلەمۆیەدا برژابێ.

**خۆرەتاو:** بەرهەتاو، هەتاو.

**خۆرەتاودان:** وەبەر هەتاودان.

**خۆرەچەرە** (کە.): تەنگەنەفەس، هەناسەبڕکە، ئەو لوولەیە لە ئاشیدا، کە دانی پێدا دەڕژێتە نێو بەرداشەکەوە.

**خۆرەزەرد:** کاتی زەردەی بەیانیان و ئێواران، زەردەڵ پەڕ، بەرەئێوارە.

**خۆرەسەرە** (دەر.): خۆرە.

**خۆرەڵات:** ڕۆژەڵات.

**خۆرەڵاتناس:** ڕۆژەڵاتناس. ــ ی: ڕۆژەڵاتناسی.

**خۆرەن** (ئەردە.): خۆراک.

**خۆرەنگاز:** هەتاوگاز، چتێکە هەتاو گەزتبێتی.

**خۆرەوەزان:** بەریەرۆچکە.

**خۆرپەڕ:** ڕۆژاوا.

**خۆرپەران:** کاتی ڕۆژاوایە.

**خۆرپەرست:** ڕۆژپەرست. ــ ی: ڕۆژپەرستی.

**خۆرت** (باد.): گەنج، جحێڵ، لاو.

**خۆرتانی:** جحێڵانی، لاوی.

**خۆرتی:** لاوی، جحێڵی.

**خۆرزەدە:** خۆرەنگاز.

**خۆڕست:** لە خۆڕا پەیدا بوو، شینایێکە بە بێ چاندن سەوز بوو بێ. (فە.) ــ ی: خۆڕسکی.

**خۆڕیسک:** (موک.) خێرۆک، زگماک، لە خۆوە پێگەیشتوو، ئەودەخڵەیە، کە لە دانی وەریوی پار شین بوو بێتەوە. دارێکە لە خۆیەوە ڕوابێ، چتێکە لە خۆوە هاتبێتەدی. ــ ی: ڕەمەکی.

**خۆرش:** خۆرشت.

**خۆرشت:** (باک.) پێخوارن، جوورە چێشتێکی شل و ئیترە، کە پلاوی پێ دەخورێ، یەخنی. (باد.) پێخۆر، خورش.

**خۆرشی** (ئەردە.): ڕووجیار.

**خۆرک** (هەو.): خۆرە.

**خۆرکە:** خۆرە.

**خۆرگە:** چیکڵدانە. وورگ، خواردنگە، ڕۆژهەڵات، شوێنێکە ڕۆژی لێ هەڵبێ.

**خۆرکەوتن:** خۆرهەڵاتن، خۆردەرچوون.

**خۆرلەزەردە:** کاتی زەردەپەڕ.

**خۆڕم** (شن.): ئامێزە گیا یا دەغڵێکی درواوە، کە بە شەنە هەڵگیرێ بۆ سەر کێشەوهتد.

**خۆرنەگەز:** نسار، شوێنێکە لە داوێن یا بەرقەدی چیایانی بڵند، کە خۆرنەیگرێتەوە یا کەمتر بیگرێتەوە.

**خۆروەزان** (ئەردە.): بەریەرۆچکە. خۆرهەڵات.

**خۆرنەوەزان:** شوێنێکی سەختە لە نێو چیایاندا، کە هەتاو نەیگرێتەوە و گیای تێدا سەوز بوو بێ و تک تک ئاوی لێ بچۆڕێتە خووارەوە، خۆرنەگەز، نسار، نسرم، سیوەر.

**خۆرنشین:** ئەوشوێنە، کە بە دیمەن خۆری لێ ئاوابێ. کەسێکە لە خۆراوایە دانیشتبێ یا لەوێ لە دایک بوو بێ، کەسێکە لە پێش خۆردانیشی. دانیشتن لە هەرێمی ڕۆژاوایە.

**خۆرۆنان** (موک.): خۆدانان، خۆبەختکردن، خۆ لە پێناونان.

**خۆڕوو** (ڕەوا.، هەو.): خووڕی، یەکڕوو، برجەقان، (هەورا.) وێژی، وێژە، پەتی، سادە، یەکڕەنگ. ــ یی: خاوێن، پاک، وێژەیی.

**خۆرهەڵات:** ڕۆژهەڵات، کاتی ڕۆژهەڵاتن، شوێنێکە خۆری لێ هەڵبێ.

خۆرهەڵات

**خۆرهەڵاتن:** ڕۆژهەڵاتن.

**خۆرهەڵاتی:** خەڵکی لای ڕۆژهەڵاتی.

**خۆرهەڵاتی ناس:** کەسێکە لە مێژوو و وێژە و ئەردناسی خاکی ڕوژهەڵاتی بە دانیشتووەکانیەوە شارەزا بێ. ــ ی: پیشەی کەسێکییە، کە لە مێژوو ووێژە و ئەردناسی خاک و دانیشتوانی خۆرهەڵات شارەزابێ.

**خۆڕی:** خووێڕی.

**خۆزە:** خۆزگە.

**خۆزکا** (باک.): خۆزگە.

**خۆزگا:** خۆزگە.

**خۆزگایەکوو:** بریا، خۆزگە.

**خۆزگە:** بریا، بری، (خۆ.) برێ، خۆزی، خۆزیا، خووزیا، کاشکی، (هەورا.) ئار. خووەزی، خووەزگە، بەزە، (ئەردە.) خوشا. مرازی ئاواتخوازتنێیە، ئاوات.

**خۆزگەبردن:** ئاواتخوازتن.

**خۆزگەخوواستن:** ئاواتخوازتن.

**خۆزی:** خۆزگە، بریا.

**خۆزیا:** خۆزگە.

**خۆژە** (ڕەوا.): (شا.) هەرزنە مێیینە، جوورە هەرزنێکی سپی و درشتە و بۆ چێشتێ و نانی دەستەدات.

**خۆسەر** (ئەردە.): مەردومی سەرەخەر، کەللەڕەق. ــ ی (ئەردە.) سەرەخەری، کەللەڕەقی.

**خۆستا** (ئەردە.): خۆپەسند.

**خۆسن** (ئەردە.): جنێو.

**خۆش:** بەتام، مەزەدار، ڕازراف، ڕانەرم، وەش، خووەش، شیرین، بۆ چتی خواردن و خواردنەوە بە کاردەبرێ، کە بە تام یا شیرین یا مزر بێ، کە بە پێچەوانە بێ نا ــ ی پێدەڵێن. بووردن، وازلێ هێنان، بەخشین. ــ بوون: لێ بووردن، دەست لێ هەڵگرتن، بەخشین. ساخ، تەندروست، لەش ساخ، باخۆش خۆشی: واتا ساخبێ، تەندروستبێ، لە کاتی سەرە خۆشیشدا وا بە کاردەبرێ: بۆخۆت، بۆخۆتان ــ بن. پەسند، دلگر، دڵڕفێن، دڵگیر، (باک.) بال وپال، باخی سیسەی دیمەنێکی ــ ی هەیە. قسەی خۆش، دەنگ وباسی ــ : دەنگ و باسی شادی هێنەر. دەنگ و ئاوازی خۆش. پەلە، چوست، توند، زوو، ــ برۆ: بەپەلە و توند برۆ. حەز، لێ ــ هاتن: پەسند کردن و قبول کردن، ــ ی لێ نایەت: پەسندی ناکات و قایل نابێ. بادامی تاڵ لە سووێراوکێ، کە تاڵاییەکەی دەبەن پێیدەڵێن

**خۆشکردن.** دەباغی، بۆغ، خار، چەرم و کەول و پێست ـــ کردن: دەباغی کردن، خاراندن. ـــ کراو: خاراو، بۆنگ کراو.

**خۆشا:** خۆزگە.

**خۆشاب** (زا.): خۆشاو.

**خۆشاتن:** خۆشهاتن، بەخێرهاتن. ـــ کردن: بە خێرهاتنکردن.

**خۆشاردنەوە:** خۆ پەنهانکردن، خۆدزینەوە. شەرمکردن، چاوشیلکانێ، فیکەکوونی، چاوشارکێ، قەرەقەرە، فیکەوەکونا (جوورەگەمەیەکە)، چاوقووچانێ، دزدزانێ، شارکەوانێ.

**خۆش ئاشنا:** هۆگر، رام.

**خۆشاڤ** (باک.): خۆشاو.

**خۆشاو** (باک.): خۆشاڤ، مێوژاو، لە ئاوی هەرمێ و خۆخ و لە تکە هەرمی وگەلێک مێوەی دروستدەکرێت، لە ئاو و دۆشاویش دروستدەکرێت.

**خۆشاواز:** دەنگخۆش. ـــ ی: دەنگخۆشی.

**خۆشە:** چەرمێکە پوختە کرابێ. ـــ کردن: خاراندنی چەرم و هەمبانە، بۆ قاڵ کردن، خاراندنی مرۆیانیش بەکاردەبرێ لە کاروبارێکی دا. ـــ بوون: خاراندنی چەرم و هەمبانە، مەبەس لە دەرهاتن و قاڵ بوونی کەسێک لە کاروبارێکی دا.

**خۆشەتالوو:** کاهووەکێویلە.

**خۆشەچین:** گوڵەوەچن، برێتییە لە یەکێک، کە لە یەکێکی تر وەرە بەهرەمەندتر ببێ.

**خۆشەخانە** (ئەردە.): دەباخانە.

**خۆشەکراو:** خاراو، پوختەکراو، پێستی دەباغکراو.

**خۆشەوبوون** (ئەردە.): چابوونەوە، خاسەوبوون.

**خۆشەوی:** نێوی پیاوانە، (باد.) خۆشەویست.

**خۆشەویس:** خۆشەویست.

**خۆشەویست:** خۆشتەڤی، دەلال، هەڤینی، نار، لەبەردلان، ژیرلۆ، ژیکەڵە، بەدل، دلگر، گێژگوول، گران، ئۆفلاز، جگەرگۆشە، گوولکە، کەسێکە زۆر خۆش بویسترێ، خووەشەویس. ـــ ی: (باک.) ئەڤین، هێڤینی، هەوینی، دلگری، خۆشەویستی.

**خۆش ئەنام** (ئەردە.): خۆش ئەندام.

**خۆشباوەڕ:** گووێ لە مست، کەسێکە زۆر زوو بە هەمووچتێکی باوەڕ بکات، زووباوەڕ. ـــ ی: زوو باوەڕکردن.

**خۆشبەخت:** خووەبیەخت، بەختیار، خاوەندنگین، خۆش نگین، ناوچاوپاک. ـــ ی: بەختیاری، ناوچاوپاکی.

**خۆشبەختانە:** خولاو ڕاستان، خواوڕاستان.

**خۆشبەز:** بەتاو، بەغار، کەسێکە زۆر توند غار بدات. وولاخی خۆش ڕەوت. کەروێشک. ئوتۆمۆبیل، بەزۆک.

**خۆشبەزجی:** بەزۆکەوان، ئوتۆمۆبیل.

**خۆشبەزۆک:** خۆشبەز.

**خۆشبەزۆکەوان:** بەزۆکەوان.

**خۆشبۆن:** بۆنخۆش.

**خۆشبوون:** گەشبوونەوەی گری ئاوری و چرایە. گەیشتنی هەندێ مێوەی وەکوو ترێ و تیتر واتا ترشی نەماوە. دوور بوون لە ئازار و چەرمەسەری ڕۆژگار. پوخت و ڕێک و پێک بوونی شار و دیمەن. ـــ ی قوڕ: پوختەبوون. بووردن، لێ بووردن، بەخشین، وازلێهێنان، ـــ ی چەقالەی تاڵ: شیرین بوون، ـــ ی چەرم و کەوڵ: خاران، وەرزین.

**خۆشبوونەوە:** چاک بوونەوە، لەنەخۆشی ڕاست بوونەوە.

**خۆشبێژ:** دەنگخۆش. نێوی پیاوانە. ـــ ی: دەنگخۆشی.

**خۆشبین:** کەسێکە بە چاکەو فەڕ و باشی بڕوانێتە هەموو کارێکی و ئەنجامێکی. بە چاکە و فەڕ و باشی لە ئەنجام و کاروبار ڕووانین.

**خۆشتەڤی:** هەلال.

**خۆشتر:** خووەشتر. ـــ ین: خووەشترین.

**خۆشحاڵ:** کەیفخۆش، دڵشاد. ـــ ی: دڵشادی، کەیفخۆشی.

**خۆشخۆر:** خۆشخۆراک.

**خۆشخۆش:** خێراخێرا، گورج گورج. بەخ بەخ.

**خۆشخوو:** ڕەند، خۆشڕەفتار، پاکخوو.

**خۆشخووان:** دەنگخۆش.

**خۆشخووێن:** ڕەزاشیرین، ڕەزاسووک. دەنگخۆش. ـــ ی: ڕەزاشیرینی، ڕەزاسووکی. دەنگخۆشی.

**خۆشخوویی:** خۆشڕەفتاری، پاکخوویی.

**خۆشدەر** (زیی.): ئافتاوە، مەسینە.

**خۆشدەماخ:** خۆشحاڵ. ـــ ی: خۆشحاڵی.

**خۆشڕام:** کەسێکە بە ئاسانی ڕابێ و هۆگربێ. هۆگر، نێوی ئافرەتانە. ـــ ی: هۆگری.

**خۆشڕەفت:** خۆشڕەفتار.

**خۆشڕەفتار:** خۆشخوو، پاکخوو، ڕەووشت. جووان. ـــ ی: خۆشخوویی، پاکخوویی.

**خۆشڕەو:** وولاخی خێرا، خۆشڕەوت، چارەوێیەکە لە ڕۆیشتندا ڕەوتی خۆشبێ. ـــ ی: خۆشڕەوتی.

**خۆشڕەوت:** خۆشڕەو، خۆشڕۆ. ـــ ی: خۆشڕەوی.

**خۆشڕۆ:** خۆشڕوو، چاپوکڕۆ، هەڵمشە، باڵەبان، شاتر. ـــ یی: خۆشڕەوی، باڵەبانی.

**خۆشڕۆی زرێدار:** تانک.

**خۆشڕۆیشتن:** پێهەڵێنان، پێ هەڵگرتن.

**خۆشڕوو:** ڕووخۆش، شۆخ، ڕووگوشاد، ڕوو واز. نێوی ئافرەتانە. ـــ یی: ڕووخۆشی.

**خۆشزمان:** زمانخۆشی، زمان شیرین. ـــ ی: زمانخۆشی، زمان شیرینی.

**خۆشزووان:** زمانخۆش. ـــ ی: زمانخۆشی.

**خۆش سەر:** خۆشجڵەو بۆ ئەسپ و ئیتر. ـــ ی: خۆشجڵەوی.

**خۆش سرشت:** پاک سرشت، بەختەوەر. ـــ ی: پاک سرشتی، بەختەوەری.

**خۆشکراو:** خاراو، خارای.

**خۆشکردن:** ــــ ی چەرم و کەوڵ و پێست: وەرزاندن، خاراندن. ــــ ی قوڕ: شێلانی و پوختە کردنی. ــــ کولانەی بنێشت. ــــ ی بادامی تاڵ: خۆشکردن. ــــ ی هەنجیری (کەمێک ڕۆن دەنێو ناوی گەرم دەکرێ و هەنجیری ووشک بە ڕستەوەی دەنێو دەنێن تا زستانێ نەرمیش بێ و لە کرمیش بپارێزرێ) پەروەردەکردنی تفاقی ترشیات. زۆر کردنی گڕی ئاوور و چرا. شیرین کردنی چەقالەو بنێشتە تاڵ بە کولاندنیان. ڕازاندنەوە و ڕێک و پێک کردنی شوورێنێک (چاپخانەکەت خۆشکردووە).
خۆشکردنەوەی باران و بەفرو تەرزە: چک کردن و ڕاوەستان.

**خۆشکێش:** توو تنێکە نەزۆر توند و نەزۆر نەرم بێ.

**خۆشگەرەک بوون:** خۆشویستی.

**خۆشگفت:** قسەخۆش.

**خۆشگۆ:** دەنگخۆش. ــــ یی: دەنگخۆشی.

**خۆش لێ نەهاتن:** خۆش نەویست.

**خۆش لێهاتن:** پەسندکردن، پێخۆش بوون، ئارەزووکردن.

**خۆشم:** من خۆشم، بۆ خۆشم. ساغم، تەندروستیم لە جێیە.

**خۆشمامەڵە:** سەوداخۆش.

**خۆشمەزە:** بەتام.

**خۆشناو:** جوورە ترێیەکی ڕەش و دەنک گەورەیە، (موک.) ساحیبی تا پاییزێکی درەنگ دەمێنێ. خێڵێکی کوردە لە هەرێمی هەولێردا ناوچەکەیان شاری شەقڵاوەیە. ناوخۆش.

**خۆشناوەتی:** خاکی خۆشناوەتییە لە نێوانی هەولێر و کۆیە و ڕەواندزێدایە.

**خۆشناوی:** خەڵکی هەرێمی خۆشناوان. ناوخۆشی.

**خۆشنەکەر:** دیوێکی میچ (جگ) ی یە.

**خۆشنڤیس:** خۆشنووس. ــــ ی: خۆشنووسی.

**خۆشنگین:** بەختەوەر. ــــ ی: بەختەوەری.

**خۆشنوود:** شادمان، ڕازی. ــــ ی: شادمانی، ڕازێتی.

**خۆشنووس:** خۆشنڤیس. ــــ ی: خۆشنڤیسی.

**خۆش وچۆنی:** هەواڵپرسی دووکەسان لە یەکتری.

**خۆش ودشی** (ئەردە.): خۆش و چۆنی.

**خۆشویستن:** ڤین، ئەڤینی، هەڤینی، دڵویستن، دڵ پێوەبوون، دڵچوون، ڤیێن، دڵ بۆچوون، ویستنی چتێک بە دڵ و گیان.

**خۆشهاتن:** بە خێرهاتن، خۆشاتن.

**خۆشهاتوو:** بە خێرهاتوو.

**خۆشی:** ئەبۆخۆی، ئەخۆشی هات. خوەشی، شادی، شادمانی، بەزم، شایی، ئەبوونی خەفەت. ساخی، تەندروستی. بەتامی، مەزەداری، ڕانەرمی، (باک.) هەڤێنی. خێرا، گورج، بەتاڵووکە.

خۆشی

**خۆشیان:** شادمانیان. چەند ڕۆژێکی خۆشە لە زستانێ دا، کە باران و قوڕی تێدا نەبێ.

**خۆشی خۆشی:** شایی شایی، شادمانی، کەیفخۆشی.

**خۆشیرین کردن:** مەبەس لە خۆتێهەڵسوون و کوتن و کردنی چتێک لای یەکێک.

**خۆشی و بێشی:** چاک و خۆشی.

**خۆفرۆش:** کەسێکە ماڵ و سامانی گێتی، لە ناوی باش و ناموس و ئابڕووی خۆشتر بووێ. ــــ ی: ماڵ و سامان و بێگانە لە ناو و ناموس و ئابڕووی خۆی خۆشتر بووێ.

**خۆڤ:** خۆهەڵکێش.

**خۆک:** هۆڵ (تەویلە) ی ماڵاتان.

**خۆکایی:** خۆبینی.

**خۆکە** (باڵە.، خۆ.، ئاک.): هۆڵ، تەویلەی ماڵاتان. پێڵاو، پێتاو.

**خۆکرد:** کاری خۆیی، دەستکرد. یەکسەرە، بێ پرس.

**خۆکردنەژێرناوا** (ئەردە.): بینەکێشان.

**خۆکردی:** کاری سەربەخۆ و بێ پرس، تایبەتی.

**خۆکوژ:** کەسێکە زۆر خۆی ماندوو بکات، کەسێکە بە دەستی خۆی خۆی بکوژێ.

**خۆکوژتن:** مەبەس لە خۆماندوو کردن یا لە خۆدان، خۆ لە ناو بردن.

**خۆکێشانەوە:** خۆ لە بەریەک کێشانەوە، کیشمان، پاشگەز بوونەوە، دەستهەڵگرتن لە کار و فەرمانێک، کێشمانی لەش، ووشەییێکە لە ڕووی سووکێتییەوە بۆ مردنی کەسێکی بەکاردەبرێ.

**خۆکێش کردن:** خوشین و ڕۆیشتن بۆ شووێنێک بە بێ هێزی.

**خۆگر:** بەرگەگر، بەرگر، شازدەهەناسە، پایەدار، دڵفرە.

**خۆگرتن:** لە شووێنێکی پەنهان و نە دیودا خۆ گرتن بۆ بیستنی ئاخۆتنی ئەم و ئەو. خووە گرتن، تبتینی، پایەداری، خۆداری، پشوو درێژی. لە ــــ: لە سەر خۆ پەیمانکردن، بەڵێندان، پەیماندان. بۆ شەتل و نەمامان، گرسان.

**خۆگورجکردن:** خۆ هەڵکردن.

**خۆگێڕان:** سەربەخۆیی.

**خۆگیر:** سەربەخۆیی، خوددار، کەسێکە، کە ددان بە خۆیدا بگرێ. ــــ ی: خودداری، ددان بە خۆداگرتن لە کارێکی دا.

**خۆگێل کردن:** بە درۆ خۆ بێگانە کردن لە شتێک، خۆناشی کردن.

**خۆل** (باک.): گڵ، خۆڵ.

**خۆڵ:** خاک، ئاخ، گڵی ووشک.

**خۆڵاو:** تیژاوی خۆڵە مێش کە بۆ خۆشکردنی مێووژ دروستدەکرێ. ــــ ی: گلاوی، خاکاوی.

**خۆڵە** (هەورا.): خۆڵ، خاک.

**خۆڵەبان** (باک.): گڵەبان، ئاخەبان.

**خۆڵەبەرنان:** تێوەچوون، دەست پێکردن، خۆتێوەدان.

**خۆڵەپەتان:** شووێنێکە خاک و خۆڵی زۆر بێ. ــــ یێ: گەمەیەکە منداڵان بە خۆڵی دەیکەن.

**خۆڵەپۆت** (ئەردە.): خۆڵەپەتانێ.

**خۆڵەپۆتانێ:** خۆڵەپۆتێ.

**خۆڵەپۆتە:** خۆڵێکی ئێگجار وورد و پێ پەست کراوە.

**خۆڵەپۆتێ:** خۆڵە پەتانێ، خاکبازی، گەمە و یاری بە خۆڵی وورد کردن.

**خۆڵەزان** (ئەردە.): ژانێکە تووشی منداڵان دێ لەبەر خۆڵ خواردنێ، ژانەزک.

**خۆڵەکەوان** (ئەردە.): تریوان.

**خۆڵەکەوە** (جا.، کە.، دەر.): خۆڵەمێش، (هەورا.) بوولێ.

**خۆڵەکوو** (زەن.): خۆڵەمێش.

**خۆڵەمرە:** ژیلەمۆ. خۆڵەمێش.

**خۆڵەمێش:** بوڵ، خەلەکوو، (باد.) مۆلک، (رۆژ.) توون، (لک.) پوول، (باک.) ئاری، رتام، حووەلی، (جا.، دەر.، کە.) خۆڵەکەوە، (هەو.، رەوا.) مشکی، (زەن.) خۆڵەکوو، (رەوا.) سوتەکی داری. (باد.) خۆلی، خۆلی چتی سووتاو.

**خۆڵبەسەر** (کرما.): لۆدەکای سەرسوواخدراو. خاک بەسەر، بەدبەخت.

**خۆڵبەسەرە** (کۆ.): گیایەکی بەهارییە هەمیشە تۆزی بە سەرەوەیە، ریحانە کێویلەیە و بۆنی خۆشە، بۆ بای سوور زۆر باشە.

**خۆڵنجان:** دەرمانێکە لە لای عەتاران دەستدەکەوێ، سۆرنجان، خولنجان

**خۆڵوەسەر:** خۆڵ بەسەر.

**خۆڵۆپاندن** (ئەردە.): خلۆرکردنەوە، گەوزاندن، خۆلۆپاندن.

**خۆلوپانن** (ئەردە.): خۆلۆپاندن.

**خۆڵوێژ** (کە.): کرمێکە چکۆڵەیە کونەکەی وە بیرێکی دەم بڵاو دەچی هەر کەس یا هەر چتێکی ببینێ دەچێتەوە نێوزەوی.

**خۆلی** (بار.، باد.): خۆڵەمێش.

**خۆلێکدان** (هەر.): زۆرەوانی، تێکوەرانی، زۆرانی. ـــ کردن: زۆرەوانی کردن. (خۆ.) ـــ ی: زۆرەوانی.

**خۆم:** من خۆم، ئەمن بۆ خۆم، خوم، (هەورا.) وێم.

**خۆماڵ:** خاوەندماڵ. ـــ ی: (باک.) خۆسەری، چتی تایبەتی کە بۆ خۆتهەڵگرتبێ.

**خۆمان:** ئێمە خۆمان، ئێمە بۆ خۆمان، خۆن، (هەورا.) وێمان، مەبەس لە بێژەرەکە چەند کەسێکی لە گەڵ بێ، کە خۆی بیڵێ لە زمان دانیشەوە.

**خۆمانە:** چت یا کەسێکی خۆیی محرم، محرەمانە، خزمانە.

**خۆمانەخۆمانە:** مەبەس لە ماڵ جوداکردنەوەی یەکێکە لەگەڵ یەکێکی تردا.

**خۆمانی:** خزمانی، دۆستانی.

**خۆمڵ** (کە.): سەربە، لەمەر.

**خۆن:** خۆمان. (هەورا.) خووێن، هوون.

**خۆنەسین:** چۆنێتی باری خۆی و دایک و باب و کار و پیشە و پایەی خۆزانین. لاوێکە یا گەورە کچێکە تەمەنی گەیشتبێتە ١٤ـــ ١٥ ساڵی، لەوەتی خۆم ناسیوە: واتا (بلوغم) بووە.

**خۆنەگیر:** خۆنەگر، سست، (ئەردە.) پلپ، کێوی، ئارام، رەمۆک، یاخی.

**خۆنەوار** (هەورا.): خووێندەوار، سەواددار، میرزا. ـــ ی (هەورا.) خووێندەواری، سەوادداری.

**خۆندەوار:** خووێندەوار. ـــ ی: خووێندەواری.

خۆندنەوە

**خۆندن:** خووێندن.

**خۆندنەوە:** خووێندنەوە.

**خۆندنخانە:** خووێندنخانە.

**خۆندنگا:** خووێندنگا.

**خۆنگ** (باک.): خوشک.

**خۆنما** (ئەردە.): خۆنووێن. ـــ یی (ئەردە.) خۆنوواندن.

**خۆنن** (ئەردە.): خووێندن. گۆرانی گوتن.

**خۆننەوە** (ئەردە.): خووێندنەوە.

**خۆنوواندن:** مەبەس لە خۆدەرخستنی کەسێکە بە کردنی چتی باش، یا پۆشاکی جوان و تازە یان بە پایەو فیشاڵ یان بە کەس وکار و کەسانی گەورە، فیزکردن.

**خووانووانن:** خۆنوواندن.

**خۆنووس:** قەڵەمی پەندان و قورقوشم.

**خۆنووێن:** کەسێکە خۆی بنووێنێ. ـــ ی: خۆنیشاندان و خۆ بردنە پێشەوە، فیزکردن، هەوانوواندن.

**خۆنیشاندان:** خۆنوواندن.

**خۆوڵات:** هاو وولات. ـــ ی: هاو وولاتی، هاوشاری.

**خۆوێلکردن:** خۆگێل کردن، خۆهەڵە کردن.

خۆنووس

**خۆه** (باد.): خوشک.

**خۆهاویژتن:** خۆفڕێدان.

**خۆهاویژتنانێ** (هەو.): گەمەیەکی کورانە.

خۆهاویژتن

**خۆهەڵبەست:** درۆ و ساختەیەکە یەکێک هەر لەخۆیەوە هەڵی بەستبێ.

**خۆهەڵتراندن:** خۆهەڵکێشانی بۆ چتێک کە لێی نەیەو لێی نەوەشێتەوە.

**خۆهەڵخستنەوە:** هەڵپەروداپەرکردن، راپەرین.

**خۆهەڵدان:** خۆهەڵکێشان.

**خۆهەڵشەنگاندن:** خۆهەڵتراندن.

**خۆهەڵکردن:** داوێن بە لاداکردن و خۆ خڕکردنەوە.

**خۆهەڵکێش:** کەسێکە بە فیشاڵ و درۆ خۆی هەڵکێشێ.

**خۆهەڵکێشان:** چاووڕاوکردن، شانازی بە چتێکە وەکردن، فاک و فیک کردن، (رۆژ.، کە.) هووشە کردن، فیزکردن، لاف لێدان.

**خۆهە** (باد.): خووار.

**خۆی:** شارێکە لە کوردستانی داکەوتۆتە بەشی کوێستانێ، کەسی سێیەمی تا کە کەسێکە نادیارە کە رووی ئاخۆتنت لەو نە بێ، ئەوخۆی، بۆخۆی، بۆخووە، بخووە، (هەورا.) وێش. ـــ هاتەنێرە: ئەو بۆ خۆی هاتە ئێرە.

**خۆیابوون** (زا.): پەیدابوون.

**خۆیان:** مەبەس لە چەند کەسێکە نادیارە کە رووی ئاخۆتنت لەوان نەبێ، کەسی سێیەمە لەباری گەلدا. (باد.) پەیدابوون. ـــ ی (باد.) ئاشنا.

**خۆیەتی:** خۆیی، خۆییتی، تێکەڵی، دۆستایەتی، (هەورا.) وێشە.

**خۆیی** (زا.): خاوەند. خۆیەتی.

**خوێزە:** نۆکەر.

**خوێخوێ** (باک.): دەنگی ئاوتییە.

**خوت** (ئەردە.): خووالا، بەتاڵ، چۆڵ، خۆڕایی بە لاّن بە تەنیّ بەکارنابریّ بەڵکو لەگەڵ خۆڕایی و خاڵیی بەکاردەبریّ وەکوو: ـــ و خۆڕایی. ـــ وخاڵی.

**خوتا:** خودا، خولا، یەزدان.

**خوتە:** بۆڵە.

**خوتەخوت:** گۆتەگۆت، ڕنگەڕنگ، هەراهەرا، بۆڵەبۆڵ.

**خوتەخوتکەر:** بۆڵەبۆڵکار.

**خوتەک:** خوترەک.

**خوتەکە** (کۆ.): جۆرە ماسییەکی چکۆڵەیە خۆ بە زەوییەوە دەنووسێنیّ.

**خوتەکەر:** بۆڵۆکار، بۆڵەکەر.

**خوتەکردن:** بۆڵەکردن.

**خوتەن** (ڕۆژ.): خۆڕایی، خوت و خۆڕایی.

**خوترە** (خۆ.): خوترمە، پەیاغ، دارێکی ئەستوورە کە بۆ شەڕدەست بدات.

**خوترەک:** کوتەک، بەرچیغ، خوترمە، خوترە.

**خوتن:** کەسێکە زۆر بۆڵە و خوتەی بکات.

**خوت وخاڵی** (ئەردە.): خوت و خۆڕایی.

**خوت وخۆڕایی:** خوت و خاڵی.

**خوت وخووالا:** خوت و خۆڕایی.

**خوتووکە:** ختووکە.

**خوجۆک:** چتی گچکە.

**خوچیّ** (باد.): خوشکیّ لە کاتی بانگ کردنیّ دا و ئاخەفتنێدا بەکاردەبریّ

**خودا:** خولا، خووا، (زا.) هۆما.

**خوداپەرست:** خولاپەرست، خووپەرست. ـــ ی: خولاپەرستی.

**خوداپەرستن:** خولاپەرستن.

**خوداحەنی:** ماڵیاوا (خوواحافیز).

**خوداخۆشی نایە:** خوواڕەوای نابینیّ و قبوولی ناکات.

**خودادا:** خودادا. ئەی خودا بەهاوار و داد. ـــ ی: خووادادی. لە بەر خودا هاوار و دادکردن و پاڕانەوە.

**خوداهەند:** خوداوەند، پەروەردگار. ـــ ی: خوداوەندی.

**خوداگیر:** خولاگیر. ـــ بوون: خولاگیربوون. ـــ ی: خولاگیری.

**خوداگیرکردن:** خولاگیرکردن.

**خودان** (باک.): خاوەند، خێوی.

**خودانەخوواستە:** خودانەکا، خولانەکا، خولانەخوواستە.

**خودانەکا:** خولانەخوواستە.

**خوودانەی نانی:** نانەشان.

**خودانبەخت** (باک.): بەختیار. ـــ ی: بەختیاری.

**خودان نامووس** (باک.): نامووسدار، بەنامووس. ـــ ی: نامووسداری، بەنامووسی.

**خوداوەند:** خوداڤەند. ـــ ی: خوداڤەندی.

**خودایەتی:** خولایەتی.

**خودایی:** خووایی، خولایی.

**خودایێتی:** خولاییێتی.

**خودبین:** خۆپەسندکار، خۆپەسەند. ـــ ی: خۆپەسندکردن.

**خودپەسند:** خۆپەسندکار، خۆپەسەند. ـــ ی: خۆپەسندکردن.

**خوددار:** ددان بە خۆداگر. ـــ ی: ددان بە خۆداگرتن.

**خودسەر:** کەسێکە هەر لە خۆیەوە بەبیّ ڕاوێژ و پرسیار هەڵکوتێتە سەر کار و کردارێکی. ـــ ی: هەڵکوتانە سەر ئیش و کار بەبیّ پرس و لێکدانەوە

**خودیّ** (شکا.، نەهـ.، هەورا.): خولا، خودا.

**خوڕ:** بە پێچەوانەی مەند، توند، بە فیچکە، بە فیچقە، بە ڕێژە بڕوا و ڕانەوەستیّ، بەخوڕ، بەخوڕڕەم (بۆ ئاوشلەمەنی). بە ـــ هاتنەخووار: بە ڕێژە و هاتنەخووار. تیژ، کونکەر. پێشرکە. خۆراک، خوواردەمەنی.

**خورازە** (باد.): کۆدە.

**خوراس** (ئەردە.): خۆراس، خوواردەمەنی.

**خوران:** خوواردران، لە خەرتلەدان، ڕیزان. ئاڵۆش لیّ پەیدا بوون، (فە.) خوریان، (هەورا.) ووریا، ووریای.

**خورانەوە:** کلۆر بوونی چت وەکوو ددان و ئیتر.

**خوراندن:** (فە.) خوریاندن، هەڵکڕاندن، شەرمخاندن، کرکاندن، خوەڕاندن، (هەورا.) ووریاندن، بە نینۆک شوێنێک لە لەش خوراندن کە ئاڵۆشی لیّ پەیدا بوو بیّ.

**خورانن:** خوراندن، کلاشین.

**خوراو:** خوواردراو. ئاڵۆش و خارشی لیّ پەیدا بوو. مۆرانە لیّ دراو. ژەنگاوی، ژەنگ تێدراو.

**خوڕاو:** خوڕەماو، ئاوی خوڕ.

**خوڕای لەمی** (هەورا.): قۆڕەی زگ.

**خوڕڕە:** ـــ ی ئاویّ: گڕڕە، گەڕە و گزگزە، دەنگی ئاو و چتی شلە کە هەڵبڕژیّ و بەتوندی بڕوات.

**خوڕڕەخوڕڕ:** نێوی دەنگی ئاوی تیژڕۆیە، خوڕەی یەک لە دووای یەکتری.

**خوڕڕەم:** بە لێزمە هاتنە خووارەوەی بارانەیە، ڕەهێڵە، ڕهێڵە.

خوڕڕەمەبارانە

**خوڕڕەمەبارانە:** لێزمە، لە نگێزە، هوورم، شینەباران، ڕێژنەبارانە، (باک.) پزووک، تاقی.

**خوڕەن:** شایان، شیاو. پارچە، پاروو، تیکە، خوواردەمەنی.

**خوڕپاندن:** داخوڕپاندن، ڕاچناندن، چڵەکاندن، داچڵەکاندن.

**خوڕپان:** داخوڕپان، چڵەکان، داچڵەکان.

**خوریە:** کورتەژن، پشێوی، ئاڵۆزی، کوریە، کورتە، ئالە، تەکان، تەپە، وەلی دیوانەدەڵێ: ئێلی مرادی خوریەی تێکەوێ، لە تاوی سەرما هیچ کەس نەسرەوێ — لە دڵ کەوتن: ڕاچەنین، دڵخوریان، دڵداخوریان، داچڵەکینی دڵ. — لە دڵ خستن: ڕاچەناندن، دڵداخوریاندن، لێدان، — لە دڵدان.

**خوریان** (ئەردە.): داخوریانی دڵ، لێدان.

**خورت:** وولاخی بزێوی سەرکێش، دەوڵەمەند. گیانداری قەڵەوی تەنگەتیلکە. (ڕەوا.) گردێکە لایەکی هەلدێرێ، ئازا، بەتین. (باک.) هێز، تین. جحێڵ، لاو، کوڕی گەنجی جووان. زۆر، بێداد، جەور، بە — ی: بە زۆری، بە توێزی.

**خورتانی** (باک.): جحێڵی، عازەبی، لاوی.

**خورت بووک** (باک.): بە هێز بوون، بێدادبوون، زۆرداربوون، جحێڵ بوون.

**خورتی:** هێز، بێدادی، وەگەنەگ، — لێکردن، بە — هێنای: بە زۆر هێنای.

**خورج** (شار.): تێرێکە جووان دەچنرێ تووکدارە کە پڕکرا لە کەل و پەل قوڵفەکانی تێکهەلدەکێشرێن. پاشکۆ، خورجەزین، هەگبە، خورجێن، (هەورا.) تێرابی، تێر، دەفرێکە وەکوو هۆر لە خوری ڕێسراو دروستکرابێ، بەلام دەرگایان جودایە، دەرگای هۆر لە سەرەوەیە لەسەر باری و پانی، دەرگای خورج لەناو کۆڵی هەردوو تاکە دایە لەسەر باری درێژی بە ئەلەفە لە یەکتر هەڵدە پێکرێت.

**خورج ئاوداری:** جوورە تێرێکی گچکەیە لە پشتی وولاخانی دەکەن، بەردو قسڵ و خشت و چتی تری پێدەکێشن.

**خورجەزین** (باک.): خورج، هەگبەی پشتی سوواران.

**خورجک** (باک.): خورجی گچکە.

**خورجێن:** تێرک، جەم، چەمالەک، پاشکۆ، هەبان، خورج، تێر.

**خورچەزین:** هەگبە.

**خوڕخوڕ:** ڕێژنە بۆ ئاوو فرمێسک و شلەمەنی، فرمێسکی — دەهاتە خوار: فرمێسکی وەک ڕێژنە بارانە هەڵدەوەراند.

**خوڕخوڕۆنەک** (باک.): پرژی گچکە.

**خورد:** کورتکراو، کەم بوو. (باک.) شایان، لێ وەشانەوە.

**خوردە** (باک.): گچکە، زۆر گچکە و وورد، ووردە لە پارە و دانەوێڵە و چتی تر، داوێن پیس.

**خوردەبین:** ئاستەم بین، میکروسکۆپ. ووردبین، ووردەبین. — ی: ووردەبینی.

**خوردەفرۆش:** ووردە فرۆش، ووردە واڵە فرۆش. — ی: ووردە فرۆشی.

**خوردەک:** ووردە واڵە.

**خوردەکار:** ووردبین. — ی: ووردە واڵە فرۆشتن. ووردە بینی.

**خوردەگیر:** ڕەخنەگر. — ی: ڕەخنەگیری.

**خوردەمەنی** (باک.): ووردە، خوردە، ووردەواڵە.

**خوردەناس:** ووردەناس. — ی: ووردەناسی.

**خوررزم:** خوڕڕەم.

**خورس:** ناوی هەرێمێکی کوردانە کە چەند گوند و شینایی و ئاوی تێدایە لە لای ڕۆژئاوای ماردینییە.

**خورسەک** (ئەردە.): خورسگ، دارێکە هەر لە خۆیەوە سەوز بوو بێ.

**خورش:** خورشت.

**خورشت:** خورش، ئاڵۆش، خوراکی لەش، خارشت.

**خورشید:** هەتاو، خۆر، ڕۆژی ئاسمانێ.

**خورشیدی خاوەر:** پەڕ تووکێکی کوردی دڵدارییە و هەڵبەستراوە باسی سەودا وئازایی و بە ئارەزوو گەیشتنێ دەکات. خۆری ڕۆژ هەڵاتێ.

**خورشیدی:** جوورە گۆرانییەکی خۆشی کوردییە. جوورە قاقەزێکی سپی و لووسە وێنەی هەتاوی تێدایە.

**خورک:** خۆرکە، ژەنگ.

**خورگە:** شوێنێکە ئاوی بە خوڕ و بە تیژی پێدا ڕەوان بێ و لێژ بێ. پرژ، سوولی، سوولاڤ، شوێنێکە لە خووار شاری سلێمانی کە ئاو ڕێژی شاری سلێمانییە.

**خورم:** خوڕڕەم.

**خورما:** بەری دارێکی گەرمانییە خۆی زەرد و ڕەش و سوور باوە و زۆر شیرینە، دارەکەی هەمیشە سەوزە، گەڵاڕێژانی نیە، گەڵای وەکوو گەڵای قامیشە بەژن و قەدی دارەکەی تووێژاڵ تووێژاڵە و وەکوو داری تر بەکاری دارتاشی نایەت، لەکاتی ڕشانەوە و بەرگرتن دا تاتۆوی نێرەی پێوە نەکرێت بەر هەڵناپێچێ خورماش وەکوو ترێ جووری زۆرن. خورمە.

خورما

**خورماچیچان** (دەر.): خاشخاش.

**خورماسیچان:** گیاندارێکە وەک سمۆرەیە بەڵام لەو زۆرگچکەترە وەکوو ویش تووکن نیە هەمیشە لە ناو دارخورمایاندا دەژی.

**خورماو** (هەورا.): خورما.

**خورماوڕۆن:** چێشتێکە لە ڕۆن و خورما دروست دەکرێ.

**خورمای** (هەورا.): خورما.

**خورمای هێندی** (هەورا.): خورماوی هیندی.

**خورمایی:** جوورە ڕەنگێکی سوور کارە وەکوو خورما.

**خورمابیلە:** گیایەکی بەهارییە وەک ئاڵەکوک بەڵام ئەمیان سەلکەکەی شیرینتر و گەڵای شین ترە.

**خورمە** (باک.): خورما.

**خورۆش:** ئاڵۆشی بە تەووژم.

**خورۆشان:** هەراو هۆریا و بەیەکاچوونی مەردوم.

**خورۆشاندن:** وورووکاندن و تێکدانی کۆمەڵێک.

**خورۆشاو:** خرۆشاو.

**خورۆک** (باک.): خوریک.

**خورۆکە** (ئەردە.): خورووکە.

**خورۆمە** (هەو. باد.): تاوانی کۆکراوەوە.

**خوروو:** خارشت، ئاڵۆش.

**خورووزەک:** دەردێکە لە گەروو و سینگی مرۆی پەیدا دەبێ و دەنگی دەکەوێ و پشووی سووار دەبێ، ئەگەر فوو بەو کونەی لای سەری کیسەڵی

دا بکات چاک دەبێتەوە نیشانەی ئەوەیە خووێنێکی ڕەشی لە گەرووی دێ.

**خورووک**: ئالۆش.

**خورووکە**(ئەردە.): خورووک، خروێرکە.

**خوری**: (هەر.) هری، (باک.) جەزوو، (هەورا.) پەژم، (زەن.، ڕۆژ.) پەشم، (دەر.) بلوول، (باک.) پۆر، تووکی مەڕە. (شەم.) خۆراک. (باک.) خروێرکە، گرووێیی، ئاولە.

**خوڕی** (باک.): پەتی، خوەڕوو، وێژە.

**خوریان**: خورانی لەش، خارشت. خوواردن.

**خوڕیانەوە** (ئەردە.): خوڕانەوە، خوران، ڕزان، هەلۆل بوون، قەڕوول بوون، پووک بوون.

**خوریەجنە** (پژ.): قەوزە.

**خوریەجنۆکە** (پژ.): قەوزە.

**خوریس** (دەر.): تف.

**خوریک** (باد.، هەو.): خروێرکە.

**خوریکاوی** (هەو.): گروێ، ئاولاوی.

**خورێکە**: خروێرکە، ئاولە.

**خورێن**: ناشتە، ناشتا، ئاناشتا، (باک.) خورین، هیچ نە خوواردوو. زۆر خۆر. جێگایەکە لە نێو چۆم و ڕووبار و ئیدیکەدا کە ئاوی بە خوڕ تێدا بڕوات. خورانی لەش. هەڕەشە کردن، دژواری نیشاندان، دەنگدان، فەرمان بەسەرداکردن، تووڕەبوون، شانازیکردن، گوڕاندن، فەرمانکردن، فەرماندان، داخوڕین. شانازی کردن، نازکردن، فشین، نازین، پێ ـــ: شانازی پێکردن. بەکێ دەخوڕی: بە کێ دەفشی؟، لێخوڕین، ئاژۆتن. خورین. گۆرانی خۆش گوتن. ناوبردن.

**خورێنی**: ناشتایی، ئاناشتایی، بە ـــ چامەخۆوە: لە پێش ئەوە دا چێتێک بخۆی بەیانیان چای مەخۆوە.

**خورینی** (باک.): خورێنی، (باد.) خرێنی.

**خوز**: چۆلاییێکە لە قەراخ ئاواندا کە ماسی دەچێتە ژێری. (باک.) کەوان، کەوانە. خۆزگە. کاچ، بن کلچ، چۆلاییێکە لە بن کەنداندا کە لە زستانێدا ماسی خۆی تێدا دەشارێتەوە.

**خوزە**: خوزگە، مۆلگەی ماسیان لە ئاویدا.

**خوزگە**: شووێنێکە لە چۆم و ڕووباراندا کە ماسی قولاغەی تێدا بێ.

**خوزی**: تف، ئاوی زار.

**خوزیا**: خۆزگە.

**خوژە**: گیایەکی بەهاری کووێستانییە گەلای باریک و سێ کووز و کولۆرە بنەکەی دەکوتن دەبێتە چرێش.

**خوژیلک**: شیرکوتک، ئالقەتیز، (باک.) خووەشیل، (دەر.) شیرکتک، خوشیلک، گیایەکی شیرداری گەلاسەوزە شیرەکەی بۆ ڕەوانی زۆر باشە بۆ سەفراش بێ وێنەیە، تنۆکێک لە شیرەکەی تێکەل ئیستیکانێک ئاو دەکرێ و تێکەل دەکرێت نیو ئیستیکانێک بۆ پیاوی گەورە بەسە کە بیخوواتەوە بە سەر و ژێرەوە کار دەکەوێت کە زۆر پێی تێکچوو ماستاوێکی ترشی بدرێتی کە بێ هۆشیش بووبێ وەهۆشی دێنێتەوە. شیرەکەی بۆ بیرۆش زۆر باشە کە بە سەری داکرێ، دەیسووتێنێ.

**خوس**: ووس، ووست، ـــ بوون، ووست بوون.

**خوسپ**: لە پاشملە باسی کەسێکی بە خراپی کردن.

**خوست**: هەست، بێ ـــ: بێ هەست.

**خوسرەو**: نێوی پیاوانە. پادشا، شا، خونکار، میر.

**خوسن** (ئەردە.): خۆسن، جنێو، دوژین، دژمان.

**خوش** (باک.): چێشتێکی کوردییە.

**خوشا** (باک.): خوشینی ئاوێیە، (ئەردە.) خۆزگە.

**خوشان**: خوشینی مار و ئیتر. (هەورا.) کشان، خوشینی مار و خزاندن.

**خوشاندن**: کشاندن، کێشان.

**خوشە**: دەنگێکە وەک دەنگی دۆشینی شیر.

**خوشەبوون**: خوشین.

**خوشەخوش**: خوشەی یەک لە دووای یەکتری.

**خوشبین** (هەکا.): گیابەند، گیای سەگی هار.

**خوشک**(باک.): خۆچک، خوواک، (هەورا.) والە، والێ، (لو.) خووار، (ڕۆژ.) خووا، خووالە، خێشک، ئافرەتێکە لە دایک و باوکت یا لە یەکێکیان بوو بێ.

**خوشکانە**: وەکوو خوشکان.

**خوشکایەتی**: شێوە و باری خوشک لە خوشکایەتیدا.

**خوشکەزا**: خووارزا، والەزا، منداڵی خوشک.

**خوشکەزازا**: منداڵی منداڵی خوشک، نەوەی خوشک.

**خوشکەلێ**: لە ڕووی خۆشەویستییەوە بۆ خوشک بەکاردەبرێ، خوشکێ.

**خوشکۆک** (باک.): جووان، لاوچاک، دەلال، قشت (بۆ نێرە و مێیە)، (زا.) هەیف، شۆخ، قنج، لاو، خشکۆک.

**خوشکۆل**: بڕوانە: خوشکۆک.

**خوشکێ** (باد.): خوچێ. خیچێ، خیچۆ، خوشکۆک. لە کاتی ئاخافتنێ دا بەکاردەبرێ.

**خوشکێش** (زا): وولاخی ڕەوانە.

**خوشکی** (باک.): ووشکی، پانایێکی ووشک.

**خوشیان**: خۆشیان.

**خوشیانەوە**: (ئەردە.) کوژانەوە.

**خوشیل**: خوشیلک.

**خوشیلک** (ئەردە.): قوشیلک، خوژیلک، خوشیلکە، خوشیل.

**خوشیلکە**: خوژیلک.

**خوشین**: خشین، ڕاخوشین، ڕاخزین، چەلەچەپک چوون،، خوشان، زەلهان، کشین، خزین، خزان، داخزین. ـــ بۆهەموو چێتێک بەکاردەبرێ کەبەسەر زەوی دابخوشێ. ـــ ی مار: شێلهان، فیزین. (باک.) هاشەی ئاوێیە.

**خوفتەوبێدار**(ئەردە.): خەوالوو.

**خوک**: بڕوانە: خووک.

**خوکی**: بڕوانە: خووکی.

**خول:** سوور، چەرخ، تـل، تلۆر، خل، خلۆر، گـەڕ، پێچ، پێچە، چەرخـەی چت، گێچ،تاو، خول، جارەسووڕانێک، ئەوخولخولـەیە جووان خول دەخووا. ـــ بوونـەوە: خلۆربوونـەوە، تـل، تلۆربوونـەوە. ـــ خـوواردن: خولانـەوە، گلانـەوە، گـل خوواردن،گـەڕان،سووڕان،وەرلـێ کـەتن، پێچەبـەدەورەدان، پێچ خوواردن. ـ کردنەوە: خول پێدان. (هەورا.) خێـل.دەقیقـە. ـــ ێـک: دەقیقەیێک. (زا.) گیاندارێکە ملی خووار بێ ونەتووانێ بەرزی کاتەوە.

**خولّ** (ئەردە.): خۆلّ.

**خولا:** خووا، خودا، خوداوەند، خودێ، خووەدی، یەزەتە، یـەزدان، کارساز، یەکتا.

**خولاپەرست:** خوداپەرست. ـــ ی: خوداپەرستی.

**خولاپەرستن:** خوداپەرستن.

**خولاداو:** خوداداو، هاوارخودایە. ـــ ی: دادوبێدادی بردنەلای خودا.

**خولاگـیر:** کەسێکەبەپشـم و ڕق و کیـنـی خـودا گرفتـاربی. ـــ ی: گرفتاربوون بەپشم و ڕق و کینی خودا.

**خولام:** بەندە، نۆکەر، کۆلـە، بەنی.

**خولامانە** (هەورا.): کاکوڵ.

**خولان:** سووڕان.

**خولانەخووستە:** خودانەکا، خودا نەخوواستە.

**خولانەوە:** سووڕانەوە، خولخوواردن، چەرخان، زڤڕان.

**خولاندنەوە:** سووڕاندنەوە، چەرخاندنـەوە، زڤڕانـدن، خـول پێدانـی چـت بەدەوریخۆیدا.

**خولاوڕاستان:** خوواوڕاستان، خۆشبەختانە.

**خولایەتی:** خووایەتی، خودایەتی.

**خولایی:** خودایی، خووایی.

**خولە** (هەورا.): خۆڵ.

**خولە** (ئـەردە.): کورتکراوەوەی (خودامراد) ە، سووڕانەوە، گـەڕیان، بـۆ چی وا هەر ـــ ت دێ؟، (بابا.): کورتکراوەوەی (مەحمود).

**خولەخول:** خولی یەک لـە دووای یەکتری.

**خولەک:** دەقیقە.

**خولبوونەوە:** خلۆربوونەوە.

**خولّتە** (ئەردە.): چاپلووسی، کلکە سووتە، تێکەڵی.

خولخـوواردن: گـەڕان، سـووڕان، پێچـران، پێـچ خـوواردن، پێچرانـەوە، گلخوواردن، وەرلێکـەتن، پێچەبـەدەورەدان، تلـدان، زڤـڕان، خولانـەوە، سووڕخوواردن.

**خولخولە:** خولخولۆکە، فرفرۆکە.

**خولّخولّە** (ئەردە.): کەپوورە، خولّـوو، هەنگامـە، قاڵ، غولّغولّـە، هـەرا، زلّـە، هووڕا.

**خولخۆلە:** ملی شەربەو جەرە و گۆزەی شکاو.

**خولخولۆکە:** چتێکە منداڵان بە خولاندن و سووڕاندنی وی گەمەی دەکەن.

**خولدان:** پێچدان، سووڕاندن، ڤەوەژارتن، خولاندنەوە، سووڕدان.

**خولدران:** پێچران، سووڕان.

**خولدراو:** پێچراو.

**خولّک** (ئەردە.): خولق.

**خولّک:** دەستوور، ڕێدان.

**خولکردنەوە:** تل کردنەوە.

**خولک کردن:** ڕوودان بە کەسێک یا چەند کەسێک، بانگهێشتی کردن.

**خولّنۆت** (ڕەوا.): بەرووبۆ، داهات.

**خولّنجان:** خولّنچان، دەرمانێکە، سۆرنجال.

**خولۆر:** خل، خول. ـــ بوونەوە: گلۆر بوونەوەی چتێک لـە لێژییـە کـەوە. ـــ کردنەوە.

**خولّوو** (ئەردە.): خولّخولّە.

**خولّووپانەوە** (ئەردە.): خولّووپانن.

**خولّووپاندن:** گولّۆفتن، گولّۆفتنەوەی گیانداری، کـە گیـاندارێکی تری لـە ژێر خۆی نـابێ و بی گلۆفێتـەوە، گـەوزاندن. تاجییەکـە کەروێشـکەکەی خولّـوپانەوە.

**خولّووپانن** (ئەردە.): خولووپاندن، تلانن، تلاندن، خولۆرکردنەوە.

**خولّووپیان:** گولّۆفران، گەوزان.

**خولووپیانەوە** (ئەردە.): خولّووپیان.

**خولی** (باد.): خۆڵـەمێش.

**خولیا:** سەودا، کەڵکەڵە، مـەراق کەوتنەسەر. گێژو وور.

**خولیانەوە:** خولانەوە، سووڕانەوە، گەڕان، گەڕیانەوە.

**خولیایی:** سەودایی. گێژ و ووری.

**خولیسە** (باد.): شینشینک.

**خولێنکە:** خولخولۆکە.

**خوم** (کە.): خم، جوورە ڕەنگێکی شینە بەن و چتمەکی پێ ڕەنگ دەکرێ.

**خومار:** مـەست و سەرخۆش. هەڵم و بووق و تۆزی ئاسمان. ـــ ی: مەستی، سەرخۆشی.

**خومالی** (باد.): خۆماڵی.

**خومالیک:** جەرەی گەورە.

**خومەڕەژە:** خومـەرێژە.

**خومەرژە:** خومـەرێژە.

**خومەرێژە:** باڵندەیەکی سەوزی شین کارە بەقەد هەنگەخۆر (قژاڵکە) یەک دەبی، خمرێژە، سەوزەکەوا، کەندەسمە، ڕەنگاڵە.

**خومەشۆینە:** خەمەشێونە، ئـاوور کـەرەوە، (ئـەردە.) سـەربە گێچـەڵ، هەراوهوریا کار.

**خومەشووێنکە** (ئەردە.): خومەشێونە.

**خومەشێونە** (ئەردە.): مەردومی بە ئاشووب.

**خومچی:** خومخانەچی.

**خومخانە** (کە.): خمخانە.

**خومخۆرک** (کە.، بابـا.): قوولّکەیەکە مرۆ یا جرج قوولّی کرد بێ، لـە ڕێگاو چۆڵاندا وولاّخی تێدەکەوێ، قەڵـشتی زەوی.

**خومخوم** (باک.): دەنگی ئاوی گرانە. نێوی ئافرەتانە.

**خومری** (زا.): سووری تۆخ.

**خومستان** (ئێره.): بیابان.

**خومشێوان:** خم شێوان.

**خومگەر:** خمگەر.

**خومی** (کە.): خمی، ڕەنگی خمی.

**خومیزین:** کووژانەوەی ئاوور.

**خومین** (زا.): خومین، دەنگی ڕووخانی چت. (باک.) هاشەی ئاوێیە. خومی.

**خوناڤ:** تەڕایی و ئاوێکە شەوانە بنیشێتە سەر گژ و گیاو شیناوەردیان، (باک.) خوناو، ئاوونگ، شەونم. بارانێکە هێواش بباریێ، وورده بارانە.

**خوناو:** ئاوونگ، شەونم، خوناڤ، ئاڤینگ، ئەو تنۆکە ئاوانەیە کە بەیانیان لە بەهار و پاییزاندا بە سەر گەلاّ و گیا و گوڵانەوە دەبینریێ. بارانی وورد.

**خوناوە:** ئاوێکە لە سەری داری سووتاوەوە، کە تەڕیێ دەری دەکا لەکاتی سووو تانیدا دەری دەکات.

**خوناوک:** خوناو، ئاوونگ، شەونم.

**خوناوکە:** خوناو، ووردەبارانە.

**خونجان:** گونجان.

**خونجاندن:** گونجاندن.

**خونجانن:** گونجاندن.

**خونجگا** (ئەردە.): جێگایە مرۆ بتوانیێ تێیدا بسرەویێ.

**خونجگە:** خونجگا.

**خونجیان:** خونجان.

**خونچان** (ئەردە.): گونجان.

**خونچاندن** (ئەردە.): گونجاندن.

**خونچانن** (ئەردە.): گونجاندن.

**خونچە:** نێوی ئافرەتانە. هەچە، گوڵی نەپشکوتوو، (باک.) پشکۆڤ، بیرۆڤ. دوگمە.

**خونچیان** (ئەردە.): گونجیان.

**خوندکار:** جادووگەر. (باک.) میر، شا، پادشا، میری میران، خونکار. ـــ ی: میری میرانی.

**خوندکارێتی:** میری میرانێتی، خوندکارانە.

**خوندن** (باد.): خوێندن.

**خونڤین** (باک.): خونینی بارانە.

**خونک:** کەسێکە زۆر ئارەزووی دەستبازی بکات و خۆی لەم و لەو هەڵبسوویێ. ئەنگوتک ئەژمێر، گونک ژمێر.

**خونکار:** پادشا.

**خونکارێتی:** میرێتی.

**خونکەبیک** (دەر.): بارانێکە لە سەرەخۆ بباریێ.

**خونین:** وورده بارانێکە لە سەرەخۆ بباریێ. نم نمە دەخونیێ.

**خوی:** ئاکار، ڕەوشت، خوو.

**خوە** (باد.): ئارەقە.

**خویا** (باک.): دیار، ئاشکرا، ئاسراو. ـــ بوون. ـــ کرن.

**خویاری** (ئەردە.): پەروەردەکردن، چاوەدێری، خێوێتی، ئیوەت.

**خویان** (باک.): کەسێکە لە دێیەکی دانیشیێ.

**خوو:** ڕەوروشت، پیشە، ڕەفتار، جر، بانەک، نەریت، ئەدا، شێوە، پرەنگ، کەنشت، سەروسەکەت، (ڕۆژ.) تووزم، (چی.) هیم. ـــ ی چاک: هیچاک. بەدخوو: بەدتووزم. ـــ ی خراپ: گەشکە، فیێ، هۆ، پەرکەم، دەردەکورتان. ـــ گرتن: فیێ گرتن، هۆگرتن. (هەس.، زەن.، سن.، هەڵ.، باک.) ڕەووشت. زیز، زوویر، تووڕە. ـــ بوون: زوویر و تووڕە بوون.

**خووا:** خودا، خولاّ، خودێ: ـــ یاریکارت بێ: خولاّ یارمەتیت بدات. ـــ خۆشی نایەت: خودا ڕەوای نابینیێ. (ئەردە.) خوواه، کە، یا، یان. داواکار: بە لاّن بە تەنیێ بە کار نابریێ: ئازادی خووا، شەڕخووا. (ڕۆژ.) خوشک. ویستەر: نیشتمان خووا: نیشتمان خوواز. نمەک.

**خووا بیکووژیێ:** خووا لە ناوی ببات، خودا بیگریێ، خودا مەرگی بدات.

**خووا پەرس:** خوواپەرست. ـــ ی: خوداپەرستی.

**خووا پەرست:** خوداپەرست. ـــ ن: خووا پەرستان. ـــ ی: خوداپەرستی.

**خووا پێدان:** میهرەبانی و بەزەیی خودایە لەگەڵ بەندەیێکی خۆی بە دانی بەهرەیەک.

**خووا پێداو:** کەسێکە تووشی بەهرەیێکی بوو بیێ.

**خوواترس:** پارێزگار.

**خوواجا:** خوواجە.

**خوواجانە:** (هەورا.) خوواجەنشین.

**خوواجەوەستا:** پیر، گەورە، کاک، ئاغا، ئەفەندی. نازناوێکە بۆ ڕێز لە کاتی دوواندندا بۆ فەلان و جوولەکان بەکاردەبریێ، پیری کۆنەساڵ. نێرەمووک، خەساو.

**خوواجەنشین** (هەورا.): خوواجانە، دوو سەکۆی گچکەی لای ڕاست و چەپی دەرگای حەوشە لە ڕووی دەرەوەدا.

**خوواجوو:** خوواپەرست.

**خوواچەشتن:** خوویێ چەژتن، مەزەکردن.

**خوواچەنی** (هەورا.): ماڵیاوا، خووا حافیز.

**خوواخۆشهاتن:** ڕەوابینینی خودا.

**خوواخۆشهاتوو:** لە لایەن خوواوە ڕەوا بینرا.

**خوواخوواز:** خوداپەرست. خوویێ داواکار.

**خوواخووست:** ویستی خودا، چارەنووس.

**خوواداد:** بەهرە و بەشێکی باشە، کە خودا پێی دا بێت.

**خووداگ** (ئەردە.): خوداداد، چارەنووس، بەهرە.

**خوودان:** خولاّدان، خودادان. (ئەردە.) خوویێدان، نمەکدان.

**خووار** (لو.): خوشک. چەوت، چەفت، خووەهەر، گێڕ، چەماو، چۆماو، لار، کەچ، شوورک، شەفتوول، خێچ، گەردیاو، هێس، چلووچووڤ، خووەهەر، خار، تیل، تیو. نزم، پەست، لای ژێرەوە، لاخووارک، هاتنەخووار: داگەڕان، سەرەو ژێربوون، ژێر، هێنانە ـــ: داگرتن، سەرە و ژێرکردن، داگەڕاندن. ـــ بوونەوە: چەمانەوە، داهاتن، چەمیانەوە. ـــ کردنەوە: چەماندنەوە، چۆماندنەوە، کووڕ کردنەوە. پێداچوونە ـــ: لە سەر ڕۆیشتن، درێژە پێدان.

**خووارا** (باک.): زۆر خۆر.

**خووارایی:** چەوتی، چەفتی.

**خووارە:** لار، چەتاڵ، خێچ، چەڤی، (باک.) چەفت، چیل. ــ بوون: چەقیان.

**خووارەکە** (دزە.): جوورە دروومانێکە خووار و خێچ بروات، مارپێچ.

**خووارەمریّ:** ئاشووب، ئاژاوە، شلووقی.

**خووارەوە:** نزم، خووار، ژێرەوە، (جا.) دانگە. خاریّ، لای خووارە، لای بەرەوە.

**خووارەوخستن** (ئەردە.): خستنەخووارەوە.

**خووارەوخووار:** تیوێتی.

**خووارەوکەفتن** (ئەردە.): کەوتنەخووار.

**خووارەوهاتن** (ئەردە.): هاتنەخووارەوە.

**خوواربوون:** چەوت بوون.

**خوواربوونەوە:** لار و چەوت بوونەوە.

**خوواردە:** بیّ ئایین، داوێن پیس. زۆرخۆر، کەسێکە زۆر حەز لە خواردن و خواردنەوەی بکات.

**خوواردەس:** خواردەست.

**خوواردەست:** کەسێکە لە ژێر فەرمانی ئەم و ئەو دابیت و چاوی لە دەستی ئەم و ئەو بیّ، ژێردەست. ــ ی: ژێردەستی.

**خوواردەسی:** ژێردەستی.

**خوواردەمەنی:** خۆراک، (هەورا.) واردەمەنی، چتی خواردنیّ.

**خوواردەیی:** داوێن پیسی، بیّ ئایینی.

**خوواردن:** (باک.) خارن، خووارن، (لو.) هەردن، (دەر.) کزوەت، (هەورا.) واردەی، (ئەردە.) خوردەن، بخۆ: (هەورا.) وەرە، بووەرە.

**خوواردنەوە:** نۆشان، نۆشین، ڤەخووارن، نۆشکردن بۆ شلەمەنی بەکاردەبریّ وەکوو چا و ئاو و ئیتر، (هەورا.) واردنەوە. واردیەڤە سەرکێشان: بەسەر داکێشان. ڕەوا بینین، پەسندکردن.

**خوواردوو:** کەسێکە نان یا چتێکی تری خووارد بیّ (بۆ ڕابردوو).

**خووارزا:** خارزا، (باک.) خووارزی، (هەورا.) والّەزا، خوشکەزا.

**خووارزیّ** (باک.): خووارزا، خوشکەزا.

**خووارک** (باک.): ددانی مالاّتانە: گا ــ یّ خووە د حەفتادە دەردەخەن، هیّ گاییّ مە ــ ی خووە، دەرنەخستیە: گا لە ٧ سالاّندا ددانی دەردەخا، کە دەری نەخستبیّ هێشتا جحێڵە.

**خووارکا** (باک.): ناوی خێڵێکی کوردە.

**خووارکردن:** چەوت کردن، لارکردن.

**خووارکردنەوە:** لارکردنەوە، چەماندنەوە، خواروخێچ کردن، تل کردنەوە.

**خووارگ** (ئەردە.): خوواروو، ژێرگ، خووارخووارین.

**خووارگین** (ئەردە.): خوواروو، لای خووارەوە.

**خووارن** (باک.): خوواردن.

**خووارن مایی** (باک.): پاشماوە.

**خووارۆ** (باک.): سەڵیتە، قاحپە، جندە، حیز بۆ (نێر و میّ).

**خوواروو:** لای خووارەوەی چتی.

**خوواروخێچ:** لار و لێچ، تیلاوتیل، قیل و قاچ، قیناس.

**خووارووفک** (باک.): بادی ئاویّ، پیاڵەی ئاویّ، ئاوە خۆرە.

**خوواریّ:** لای نزم و خووارەوە.

**خوواری** (ژاوە.): خووارایی، لاری، بەوار، شەفتی، چل و چۆڤی، ڕاستی خووارایی چت، ئاستی خووارایی. زەبوونی، پەستی، نزمی.

**خوواز** (باک.): خۆزگە. ویستەر، داواکار، خوواست: ئەو کالاّیە داو ــ ی زۆرە، دلخوواز.

**خووازە:** خووایشت، تکا. ڕەوا.

**خووازەکار** (باک.): دەرۆزەکار. ــ ی (باک.): دەرۆزە، سووالّ.

**خووازەلۆک** (هەورا.): سووالّکەر، دەرۆزەکەر.

**خووازبێنی:** داخووازی، (هەورا.، جا.) هێجی، خووازگێنی، داواکردنی ژن بۆ مارەکردنی. ــ کردن: داخووازی کردن، ژن خووازتن، (جا.) هێجی کردن.

**خووازبینی کەر:** کەسێکە خووازبێنی بکات.

**خووازتراو:** خوواستراو.

**خووازتن:** خوواستن، خووەستن، گەرەک بوون.

**خووازخووازۆک:** دەرۆزەکەر.

**خووازدراو:** خوواستراو.

**خووازراو:** خوواستراو، چتێکە بە خوواستن وەرگیرا بیّ.

**خووازگار:** خوواز، خوواستگار، ویستەر، بخوواز. ــ ی: داخووازی، ویستن. خووازبێنی.

**خووازگین** (باک.): خووازبێن. ــ ی (باک.) خووازبێنی. ــ کردن: خوواز بێنی کردن.

**خووازلۆک** (ئەردە.): چت خوواز، پرسیار کار.

**خووازمەنی** (ئەردە.): خووازگاری.

**خووازۆک** (باک.): دەرۆزەکار.

**خوواس** (ئەردە.): هەوەس، خوواست، خووایشت. ویستەک، کەسێکە زۆر چتی بخووازیّ. (باک.) تەشقەڵەچی، دزمێرکوژ، تالاّنکار. دەنگ و باس، ئاگا، وەلاّم. خاووس، ڕووت، قووت، پەتی لەگەڵ (پیّ) نەبیّ بە کار نابریّ. وەکوو: پێخوواس: پاپەتی.

**خوواسبوون** (باک.): پێخوواس بوون.

**خوواست:** ویست، داخووازی، ئارەزوو.

**خوواستەر:** ویستەر، بخوواز.

**خوواستەمەنی:** چتی خووازراو، خووازتەمەنی.

**خوواستن:** داوا کردنی چتێک لە یەکێک بۆ چەند دەمێک. ویستی. خوواستنەوە.

**خوواستنەوە:** خواستن.

**خوواسکرن:** پێخاووس کردن.

**خووافرۆش** (ئەردە.): فێڵباز، ساختەچی. خوویّ فرۆش.

**خوواکرد:** خوواوڕاستان، واڕێکەوت، کار و فەرمانێک یا چتێکە خووا دروستی کردبێ.

**خوواگرتن:** گرفتار بوونی کەسێک بە دەرد یا کار یان کارەساتێک لە لایەن خوداوە.

**خوواگرتوو:** کەسێکە، کە خووا تووشی دەردێکی کردبێ.

**خوواگیر:** خوواگرتوو، بە ڕق و پشمی خودا گرفتار. ـــ بوون: خولاگیربوون. ـــ کردن: خولاگیرکردن. خووی گیر، نمەک گیر. ـــ ی: خولاگیری.

**خووال** (باک.): خاڵ.

**خوواڵ** (ئەردە.): خالی و خووالا، خاڵی.

**خووالە** (ڕۆژ.): خوشک.

**خووالتک** (باک.): خالتک.

**خووالۆژن** (باک.): خالۆژن.

**خووان:** تەبەق، سینی دار. خووانکە، تەشپی. سفرە، خووانچە، مێزێکی درێژە نانی لە سەر دەخورێ.

**خووناس:** کەسێکە خودا باش بناسێ و لەژێر فەرمانی دەر نەچێ. ـــ ی: ناسینی خودا و بە جێ هێنانی فەرمانییەتی.

**خوواناسین:** خووا ناسی.

**خووانە** (دەر.، هەورا.، ڕەوا.): پنە، (شام.) سفرە، نانەشان.

**خووانەخووستە:** ووتەیێکە، کە شووێنی دوور بێ بەکاردێنرێ: ئەو چتە خووا نەکا، خووانەیکا، دووروا، دووروایی، خووانەکا.

**خووانەکا:** خووانەخوواستە، خولانەخوواستە.

**خووانچە** (ڕەوا.): سینی، مجۆعمەی مس، سینی گچکە. سەلەیەکە لە شووڵی دروستکرابێ، (هەورا.) نانەشانە، خووانە، خووانەدارینە، تەشپی، (ئەردە.) گەورە، خووانی نان خوواردن، کەشەف، سینی.

**خووانزین:** خانەی زین، شووێنی لەسەر دانیشتنی زین.

**خووانکە:** دارێکە گەزێک درێژترە و بستێکیش پان و بستێکیش ئەستوورە لە نێوەڕاستیدا چاڵێکی تێدایە موورەسەنگی لەسەر دا دەنرێ و تێی دەبڕێ. پنە، دەرخۆنە.

**خووانووس:** چارە نووس. ـــ ی: چارەنووسی.

**خووانی:** ڕووناک، ئاشکرا، دیار.

**خوواوەن:** خوداوەند، پەروەردگار، خاوەند، خودا. خوواوەند: خوداوەند، خولا، خوواوەن. خاوەند، خێوی.

**خواوەندگار:** خوداوەندگار، پەروەردگار، خودا، خولا.

**خوواوڕستان:** خودا و ڕاستان، خوواکرد، خولاوڕاستان، خۆشبەختانە.

**خوواهیش:** تکا.

**خوواهیشت:** تکا.

**خووای** (هەورا.): پێکەنین.

**خووای تەوەرزە** (ئەردە.): خووای هەوری، خووێی سپی.

**خووایی:** خودایی، خولایی، (هەورا.) پێکەنین.

**خووابیش:** تکا.

**خووایشت:** تکا، هێڤی.

**خووایشمەند:** ـــ کردن: تکاکردن، هێڤی کرن، تکاکار. ـــ ی: تکاکاری.

**خووای هەوری** (ئەردە.): خووێی سپی، (ئەردە.) خووای تەوەرزە.

**خووە** (فە.): خووێ، (باک.) خۆ: بخوە: بۆ خۆی تەنها. باج، پیتاک. (فە.) ئارەقە. مـن ـــ دایە: ئارەقەم کردووە. (باک.) ژە ـــ: لە هەر جێگایەکی بێ. ـــ دانەبەربار: یارمەتی دان. خووەبەر: (باد.) لە بەر خۆیەوە هەر بۆ خۆی هاتووە. ـــ بدەئالیکی (باک.): خۆت دوور خەوە، خۆت بپارێزە. ـــ بین (باک.): خۆبین. ـــ بینی (باک.): خۆبینی. ـــ وا (باک.): خودا، خولا. ـــ ت (ئەردە.): خۆت، تۆ خۆت. ـــ دان (باک.): خودان، خاوەند. ـــ دان ئالیکی خۆدانان: ـــ خۆ پارازتن، خۆ دوور خستنەوە.

**خۆدانبر** (باک.): خۆکردنە هۆ. ـــ دان سەر (باک.) پاڵ بەسەرەوەدان. ـــ دانۆ: خاوەند. ـــ دان بەرباریێ هەڤ (باک.) یارمەتی یەکتری دان.

**خووەدۆ:** ناوی خودایە لە کاتی بانگ کردن و هاوار لێ کردنی دا.

**خووەدێ** (باک.): خودا، خولا، خووا.

**خووەدی** (باک.): خاوەند، خودان، خێوی. خەریک. ـــ بوون: خەریک بوون. ـــ لێ بوون: ئاگادرای کردن، خەریک کردن.

**خووەدیتن** (باک.): خۆدیتن.

**خووەدی ڕەووس:** خاوەند شکۆ.

**خووەدێکۆ** (باک.): خاوەند، خودان.

**خووەدێ وۆ** (باک.): خووەدۆ، لە کاتی بانگ کردن و هاوار لێ کردنێدا بەکاردەبرێ.

**خووەر** (باک.): سەر بە خۆیی، بە گلک. سەر چاوەی داهات و دەستکەوت، خۆر، خۆرەوە. (فە.) خۆر، ڕۆژ، هەتاو، (هەورا.) ئافتاو. (ئەردە.) خوواردەمەنی، چێشت.

**خووەرا** (باک.): زۆر خۆر.

**خووەراتی** (باک.): زۆر خۆری.

**خووەڕاس** (ئەردە.): خووەر، خۆراک، خوواردەمەنی.

**خووەراندن** (باک.): خوراندن.

**خووەراو:** ڕۆژاو.

**خووەراوا** (فە.): ڕۆژاوا.

**خووەرە** (باک.): زۆر خۆر، نەوسن.

**خووەرەک** (باک.): خووەرۆک، زۆر خۆر، کەسێکە زۆر حەز لە خوواردنێ بکات.

**خووەربەر** (فە.): سەیوان، چەتر (هی زستان و هاوین).

خووەربەر

**خووەردار** (ئەردە.): ئاگادار.

**خووەردان:** وەبەر هەتاودان.

**خووەردەراتن** (فە.): ڕۆژ هەڵاتن.

**خووەرزەرد:** زەردەی خۆر.

**خووەڕستی** (باک.): زووتەلی، زەوتەلی، مەهرکی، گێل، نانسی، ناشارەزا، بێ سەواد.

**خووەرش** (فە.): خارش، خارشت.

**خووەر لێدان:** هەتاو و ڕۆژ لێدان، تاوگازی.

**خووەرنیف** (باک.): خەرنووف.

**خووەروەرگرتن** (فە.): ڕۆژگیران.

**خووەڕوو** (باک.): بەهێز، خاوێن، یەکرەنگ، خۆیی.

**خووەرهەڵات** (فە.): ڕۆژهەڵات، ڕۆژەڵات.

**خووەرێل** (باک.): دەوەن، بنچک، داری کورت.

**خووەرین** (باک.): خوڕین، شانازی کردن، بخوڕە.

**خووەزگا** (باک.): خۆزگە، کاشکای، کاشک.

**خووەزگە** (ئەردە.): بریا، کاش. ــ بردن: ئاواتخوواستن.

**خووەزۆک** (باک.): بەد خوواز. ــ ی: بەدخووازی.

**خووەزوور** (باک.): خەزوور.

**خووەزی** (باک.): خۆزگە.

**خووەسان:** خووەسان.

**خووەسانن:** خووساندن.

**خووەسەر** (باک.): سەر بە خۆ، ئازاد، بەتایبەتی.

**خووەستەک** (باک.): ئارەزووکار، زۆرداواکار.

**خووەستن** (باک.): خووازتن.

**خووەسوو** (باک.): خەسوو.

**خووەسی** (باک.): دەزگیران، نامزەد، نێولێ نراو، نیشانەکراو.

**خووەش:** خۆش، باش، پەسند، بەتام. ساخ، زیندوو، تەندروست. بێهۆش، بیاوان. بیابان. ــ بوون، ــ کرن: دەباغکردنی پێست و ئیستر، خۆشکردنی زەوی کشت وکاڵ و ئیتر. بدەڤ لێ خووەشکردن: چاپلووس.

**خووەشان:** خۆشاو.

**خووەشتن** (ئەردە.): خۆشهاتن، بەخێرهاتن.

**خووەشاو:** خۆشاو.

**خووەشە** (ئەردە.): ئامادە، زمانخۆش، شیرین زمانی. چێشتەخۆشە. شیرین، تامدار، بەتام. خۆشکراو، خۆشکریاگ.

**خووەشەخانە:** دەباغ خانە.

**خووەشتان** (ئەردە.): پیرۆز بێ، موبارەک.

**خووەشجڤات** (باک.): کۆمەڵە و کۆڕی باش.

**خووەشک** (باک.): جووان، پەسند، نەشمیلە.

**خووەشکا** (باک.): جووان، دەلال، ڕەند.

**خووەشکرن:** خۆشکردن.

**خووەشکۆک:** زۆر جووان و شۆخ و شەنگ.

**خووەشکێش** (باک.): قایم، پتەو.

**خووەشمێر** (باک.): ئازا، چاک، پیاوی چاک. (باک.) ــ ی: ئازایی، چاکی.

**خووەشنڤیس** (باک.): خۆشنووس. (باک.) ــ ی: خۆشنووسی.

**خووەشووار** (باک.): وارخووەش.

**خووەشهاتن** (باک.): بەخێرهاتن. خووەشهاتی: بەخێرهاتی.

**خووەشی** (ئەردە.): خۆشی، ساخی، تەندروستی. مەزەداری، خۆشی.

**خووەشیل** (باک.): خوژیلک (گیایەکە).

**خووەشین** (باک.): دەنگی زەنگوڵەیە.

**خووەشی و ویشی** (ئەردە.): چاک و خۆشی، هەواڵپرسی، خەوەرپرسی.

**خووەفرۆش** (باک.): خۆفرۆش، کۆنەپەرست، بەخۆهەڵگوت، خۆهەڵنەر. ــ ی: خووەفرۆشی، کۆنەپەرستی.

**خووەڤین:** خۆویست، خۆپەرست. ــ ی: خۆویستی، خۆپەرستی.

**خووەلی** (باک.): خۆڵە مێش، مشکی؛ ــ بسەرێ من: خاک بە سەر خۆم، بەد بەخت خۆم.

**خووەلیدانک** (باک.): خۆڵەمێشدان، مشکی دان، سەرگوێلک.

**خووەلی مەرمۆتک** (باک.): زیلەمۆ.

**خووەمال** (باک.): خۆماڵ، تایبەتی. ــ ی (باک.): خۆماڵی، تایبەتی.

**خووەنە** (باک.): مرازێکە بۆ پرسیار و تووڕەیی بەکاردەبرێت.

**خووەندا** (باک.): خووێندەوار.

**خووەندە** (باک.): خووێندەوار.

**خووەندەڤان:** خووێندەوار. ــ ی: خووێندەواری.

**خووەندەگا:** قوتابخانە، خووێندگا.

**خووەنن کەڵەشێر** (ئەردە.): قووقاندن، خووێندنی کەڵەباب.

**خووەندن:** خوێندن. بانگ کردن، چرین.

**خووەندی** (باک.): بانگهێشتراو.

**خووەنن** (ئەردە.): خووێندن، چرین.

**خووەهە** (باک.): خوشک.

**خووەهەر** (باک.): خووار.

**خووەهی** (باک.): خودان، خاوەند.

**خووەی** (باک.): خێوی، خاوەند، (ئەردە.) خۆی، بەنەفسی خۆی. ئارەقە. ــ کردن: ئارەقەکردن. ــ دان: ئارەقەکردن.

**خووەیبەخت** (باک.): خۆشبەخت. (باک.) ــ ی: خۆشبەختی.

**خووەی بهین** (باک.): بۆندار.

**خووەی پەرس** (فە.): خۆ پەرست.

**خووەیخاسە** (هەورا.): خۆشخوویی.

**خووەیپرێزک** (باک.): بەشێواز، پەلیار، بەتۆرە، خۆشەویست.

**خووەیزاندن** (ئەردە.): زوقم کەوتن.

**خووەیزک:** زگبرسی.

**خووەیزیاندن** (باک.): چاو پێ هەڵنەهاتن، بەدخووازی.

**خووەیسووج** (باک.): خاوەند سووچ و تاواندار.

**خووەیڤین** (باک.): لە سەر سەروچاوان، بەچاوان. ــ ی: هێزی ویستن.

**خووەیناف** (باک.): ناودار. (باک.) ــ ی: ناوداری.

**خووەیی** (باک.): خووەدی. (باک.) ــ ی: خووەدیتی.

**خووبەس** (ئەردە.): درۆ، فیشاڵ.

**خووبەستن** (ئەردە.): درۆ هەڵبەستن، فیشاڵکردن.

**خوودار:** فێدار، کەسێکە سەر و دڵ بیگرێ. ــ ی: فێداری.

**خوو و ڕەووشت:** یاسە، یاسا، ڕێ و شووێن.

**خوو و ڕەووشتخاس:** ڕەووشت باش، خۆشخوو.

**خوورستان** (باک.): گێتی.

**خوورک** (بار.): مۆرانە، (گەرد.) مرک. (هەکا.) ژەنگ، خۆرە.

**خوورمین:** دەرکران، وەرنەگیران، قبووڵ نەکران.

**خوورین:** خوران، وەخارش کەوتن. *

**خووز:** تف، ناوی زار. هێز، تین؛ نە خۆشەکە بێ خووزە. (کە.) ڕیشە و ڕەگی گیایان. (شەق.، کۆ.) سیخوار، خووس، زوقم، (باک.) کوور، چەماوەوە.

**خووزاو** (کۆ.، شەق.): زووخاوی برینان. زوقم، خووس.

**خووزتێکەران:** هاتنەوەی هێزە بۆ لەشی نەخۆشی و کەوتنەوە سەرخۆی.

**خووزتێکەڕانــــەوە:** خووزتێکەڕانــــەوە و ژیانــــەوە و بووژانــــەوەی داروردەختانە.

**خووزهێنانەوە:** وێکهاتنەوەی برینی ئەندامی درەختان.

**خووزی** (باد.): تف تا لەناو زار و گەروودا بێ ــ ی پێدەڵێن بەلاَن، کە فڕێدرا بە تف ناودەبرێ.

**خووزیا:** خۆزگە، (شا.) سیخوار، (بابا.) سیخوڕ، (کۆ.، شەق.) خووزاو، خووز.

**خووس:** (زاخ.، دهۆ.) خووسار، (دەر.) خوویسار، زوقم، بەیانیانی پاییز و زستانان و بەهاران لەبەر ساردی وەکوو تنۆکەی ئاو لەسەر گیا و پووش و پەلاَشان دەنیشێ.

**خووسار** (موک.، زاخ.، دهۆ.): زوقم، خووس زوقمی سەر زەوی. سێوی ــ هی پاییزیە، کە خووس دەکەوێتە سەری.

**خووسان:** نەرم بوونی چتێکی ڕەق دە ئاوێدا یا لە خووس نران بە هۆی تەڕ بوونیەوە، مەبەس لە دڵنەرمی کەسێکییە بەرانبەر بە هەرکەس و چتێکی، کە چاوەڕووانی لێ نەدەکرا.

**خووسانەوە:** نەرم بوونەوە، تلیسانەوە.

**خووساندن:** نەرمکردنەوەی چتی ڕەق دە ئاوێ دا، لە خووس نان، زەلاندن، خیساندن، دەڵێن ڕیشت بخووسێنە ئەوجا بیتاشە. دڵنەرمکردن.

**خوساندنەوە:** نەرم کردنەوەی چتی ڕەقە.

**خووسانن:** خووساندن، نەرمکردنەوە.

**خووساو:** چتی ڕەق لە ئاوێ دا نەرم بوو. خووس، سیخووار.

**خووساوە:** خووساوەوە. چتێکی ڕەقە بە هۆی تەڕاییەوە نەرم بوو بێ.

**خووسبوون** (باک.): بەزین.

**خووسکرن** (باک.): بەزاندن.

**خووس نیان** (ئەردە.): خووساندن.

**خووسی** (باک.): خووس.

**خووسیاگ** (ئەردە.): خووساو.

**خووسیان** (ئەردە.): خووسان، خیسان. ئارەقەکردن.

**خووش:** دەنگی شیر لە دۆشیندا. *

**خووک** (لک.، هەورا.): بەراز.

**خووکەملە:** گوریس کێشەکێ.

**خووکی** (باک.): سەرانە، خاوە.

**خووگ** (هەورا.): بەراز.

**خووگرتــن** (ئــەردە.): ڕاهــاتن، هۆگربــوون. خۆگرتــن، پارێزگــاری، دەوڵەمەندبوون. فێ گرتن. بەستران، مەیین.

**خووگــیر:** ڕاهــاتوو، هۆگــر، خــۆش ئاشــنا، زووئاشــنا. ــ ی: ڕاهــاتن، هۆگری، خۆش ئاشنایی.

**خوول** (باک.): گومبەزی، لە سەر شکلی گومبەزی، (باد.) خۆڵ، خاک.

**خوولە:** گیایەکی بە کەیف و مل ئەستوور و قەڵەوە، (موک.) هوولە، (باک.) بووغ، گابوغ.

**خوولی** (باد.): خۆڵی.

**خوون** (زا.): خووێن، هوون.

**خوونخووار:** خووێنخووار.

**خوونسەنگین** (فە.): ئێسک گران، ڕەزاگران. ــ ی: ڕەزاگرانی.

**خوونسووک** (فە.): ئێسک سووک، ڕەزاسووک.

**خوونما** (ئەردە.): خۆنووێن، بەفیز. (ئەردە.) ــ یی: خۆنووێنی، بەفیزی.

**خوونن:** دەرس خوێندن. *

**خوو وخدە:** ڕەفتار، کردار.

**خووگی:** خوگ، باج و پیتاکی میری. *

**خوو و ڕەووشت خاس:** خۆشخوو.

**خووهرا** (زا.): زۆر خۆر

**خووهری** (زا.): خۆزگە.

**خووهستەک** (باد.): خووازەڵۆک.

**خووهستن** (باد.): خووازتن.

**خووهستی** (باد.): خووازبێنی.

**خووێ** (بــاک.، مــوک.): خــووا، خــودا. (فــە.) خــوە، خــا، نمــەک، (هــەو.) خێ، خووا، (هەورا.) نمەک، مەکی، بێ خووێ: بێ مەکی، کەلە، کەلی. کانگای ــ : خووێلێـــن. (هــس.) بــەراز. (زاخ.) ئارەقــەی مــاندووێتی، نەخۆشی. ئاگاداری، بەخێوکردن، پەروەردە.

**خوویی** (باد.): حەز، ئاوات.

**خووێت** (باک.): ئێلێکی کوردە لە ژووررووی بتلیسێ وەیە.

**خووی چەشتن:** کەمێک لە چێشت خواردن لە پێش تێکردنی دا بۆ ئەوەی بزانی خووێی کەمە یا زۆرە، خووێ چێژتن.

**خووێ چێژتن:** خووی چەشتن.

**خووی خراو:** بەدخوویی، بەدڕەووشتی.

**خووێدار** (ئەردە.): خاوەند. چتی جووانی دڵگر. ــ ی: خاوەندێتی.

**خووێدان:** نمەکدان، (باک.) خووێ دانک، ئامانێکی گەورە یا گچکەیە، کە خووێی تێدەکرێ. (هەورا.) مەکدان، خووێرێژگە، تاتەبەرد یا تەختە یا سینی و چتێکی پانە خووێی لە سەر ڕۆدەکەن بۆ ئاژاڵان لە زستانێدا.

**خووێدانە:** خووێدان.

**خووێدانکه:** خێدانکه، کیسه و توورەکەی خووێیە.

**خووێر** (باک.): بەجنە خووێـر، نـاوی کۆنـە شـارێکی کوردانـە لـە نـاو (هەڤێر) کاندا و لە ژووری باژێری نوسەیبین، ئێلی بە جنەوی، بەشتەوی، باجنی، لەوناوەدا بوو.

**خووێرانگ** (باک.): بەرد یا تەختەیە، کە خووێی بـۆ ئـاژاڵ و وولاٚخان لـە سەر ڕۆدەکرێ، خووێڕیز.

**خووێڕایی** (ئەردە.): خۆڕایی.

**خووێرەنگ** (باک.): بەردێکە وەخووێ بچی.

**خووێرک** (ڕەوا.): کەرکۆڵ، گیایەکە کۆلکەکەی کارگی خوواردنێ دێنێ، (باد.) مۆرانە.

**خووێـڕی:** دەڵـە، وەیـلان، دەربـەدەر، (شـا.) تورونـدی، سـەگەبەڕ، سەرسەری، بەرەڵاٚ، گـەریدە، گـەمۆڕ گرهووێـڕ، خـۆڕی، گـەلۆر، تـۆڕی، سەرسەری، لەگام، ترۆ، بەرەڵاٚکراو، بێ کـارە، بێ کـەلک، هیـچ و پـووچ، پەتیار، شلەپەتە، گەجەڵ و گووجەڵ.

**خووێڕیز** (شا.، موک.): (باک.) خووێرانگ، بەردی پانە یـا تەختەیەکـە خووێی بۆ مالاٚتان لەسەر ڕۆدەکرێ.

**خووێڕێژگە:** چەند بەردێکی پان یا تەختەیە کە بۆ ئاژاڵ و مالاٚتان خووێی لەسەر ڕۆدەکرێ، لە بەهارێدا. خووێدان.

**خووێز** (ئەردە.): زوقم.

**خووێزا** (ئەردە.): خوشکەزا.

**خووێژنگ:** تەرکەخەم، هەڵە. ــ ی: تەرکەخەمی، هەڵە.

**خووێس** (باد.): زوقم، خووس.

**خووێسار:** شوورێنێکە زوقم و خووسی زۆر لـێ کەوتبێ.

**خووێسە** (ئەردە.): خووس، زوقم.

**خووێسک** (باک.): سەهۆڵی سپی.

**خووێش** (هەورا.، جا.): کەس، خزم، کەس و کار، وابەسە.

**خووێشایەتی:** خزمایەتی.

**خووێشک:** خوشک، (ئەردە.) خووەیشک، هاوشیر.

**خووێشکەزا:** خوشکەزا.

**خووێشک بەخووێشک:** خوشک بەخوشک گۆڕینەوە، ژن بەژنە.

**خووێشی:** خزمایەتی، وابەسە، بەسەگی.

**خووێک:** باج، خووە، خەراج.

**خووێگ:** خاوەند.

**خووێگل** (ئەردە.): پارهەڵکەر.

**خووێل:** خێل، تیل، چاوگێر.

**خووێلێن:** کانگای خووێ.

**خووێن:** (فە.) خووەن، (هەو.) خێـن، خۆن، خووێـن، وونـی (هـەورا.، لـک.، لـو.)، وون، هوون، شلەمەنیەکی سوورە لـە نـاو دەمـارو ڕەگـی گیانداراندا دێت و دەچێ. مزی خووێنی کوژراوییە کـە وەردەگـیرێ. بـە دووای هەر ناوێکەوە بنووسێ دەیکاتە بکـەر: ئاوێستا خووێـن، پـەرتووک خووێـن، داسـتان خووێـن، ئـاوازە خووێـن: گۆرانـی چـڕ. (ڕەوا.) دەردە مالاٚتێکـە ڕەنگـی گۆشـتی سـوور هەڵدەگـەڕێ. خووێنبـایی. دەردی ڕیخۆڵاٚنە. کوژتار، کوژتن.

**خووێناو:** هووناو. ئاوی قاوورمە.

**خووێنـاوە:** زوورخـاو، هوونـاوە، شـیرە، زاراو، ئـاو وکەفێکـە، کـە لـەکاتی سووتاندنێدا لە سەرەکەی تری داری تەڕ دێت.

**خووێناوڵێن** (ئەردە.): خووێناوی.

**خووێنـاوی:** خووێـنین، چتێکـە لـە خووێـن هەڵکشـابێ و یـان خووێـنی پـێ هەڵپرژابێ.

**خووێن ئەستاندن:** تۆڵەئەستاندن.*

**خووێـن ئەسـتێن:** خووێـن گـر، خووێنەخووا، (هـەورا.) هـوون ئەسـتێن، خووێنەخووێ، کەسێکە خزم یا نزیکێکی کوژرا بێ.

**خووێنەخووا** (کە.): خووێنگر، شڕەگر.

**خووێنەخووار:** خووێنکار.

**خووێنەخووارە:** خووێنخۆر.

**خووێنەخووێ** (کە.، کرما.): خووێن ئەستێن. خانەخووێ.

**خووێنەر:** کەسێکە بخووێنێ.

**خووێنبایی:** پارەیەکە لە بەرانبەر خووێنی کەسێکیدا بدرێ.

**خووێنبەر:** دەماری خووێن ڕاگوێز لە لەشدا.*

**خووێنبەردان:** بە نەشتەر لە هەندێک دەمار خووێن دەرهێنان.

**خووێن بەردەر:** کەسێکە بە نەشتەر یا گووێزان و چتی تر خووێنی خەڵکی بەر بدات.

**خووێن بەس:** کەسێکە یا دەرمان یا مرازێکە، کە خووێن ڕاگرێ. مەسڵەت کردن، داکوژاندنی دوژمنایەتی.*

**خووێنتاڵ:** ئێسک تاڵ، ڕەزاقورس، خووێنسارد، ئێسک قورس. ــ ی: ڕەزاقورسی، ئێسک گرانی.

**خووێنجگەر:** خووێنی دڵ، خەم و خەفەت.

**خووێنجمان:** خووێن جوومان.

**خووێنجومان:** خووێن بزووتن، لە بەهاراندا کە سەختی سەرما بەسەر دەچی و گەرما دێ دەست پێ بکات خووێن دەجووڵێ.

**خووێنخۆر:** (هەورا.) وون دەر، خووێنڕێژ، پیاوکوژ، خووێنخووەر. ــ ی: خووێنڕێژی.

**خووێنخووا:** کەسێکە داوای بەهای خووێنی دەکات لە مرۆ کوژ، خووێنگر.

**خووێنخووار:** مەبەس لە کەسێکییە، کە زۆردار و دڵڕەق و ستەمکاربێ و بە خووێن ڕژتن کەیفی بێ، خووێنە خووار. ــ ی: ئارەزووی خووێنڕژتن کردن.

**خووێندار** (باک.): بکوژ.

**خووێنەخووێ:** خووێنگر، کەس و کاری کوژراو.

**خووێنخووایی:** خووێن ئەستاندن، خووێن سەنن.

**خووێنداری:** پیاوکوژی، بکوژی.

**خووێندەڤان** (باد.): خووێندەوار.

**خووێندەماخ** (ئەردە.): خووێن داڕسانی لووت.

**خووێندەوار:** خوندەڤ، (باک.) خووەندەڤان، بەسەواد، میرزا، سەواددار، کەسێکە خووێندبێتی. ــ ی: خووەندەڤانی، سەواد، میرزایی، بوونە خووێندەوار، پێ گەیشتن.

**خووێندڵ:** خووێنی جیگەر، خەم و خەفەت.

**خووێندڵی:** (فە.) خوەنین، هۆنن، خووەندن، واندن، (هەورا.) وانای، وونەی، وەنەی.

**خووێندن:** خۆندن، (هەو.) خێندن، بخووێنە: بخۆنە، بووان، وانی.

**خووێندنەوە:** ڤەخوواندن، دووبارە خوێندنی چتێکی، خۆننەوە، واخووێن.

**خووێندنی کۆتر:** گماندن، گمە گم کردن.

**خووێندنخانە:** خووێندنگا، خووێندگە، قوتابخانە.

**خووێندنگا:** قوتابخانە.

**خووێندنگە:** خووێندنگا.

**خووێندنی کەڵەشێر:** قووقاندن.

**خووێنراوە:** خووێندراوەوە.

**خووێنڕەس:** خووێنخووا.

**خووێنڕژاندن:** مرۆکوژتن، خووێنڕژتن.

**خووێنڕژانن:** مرۆکوژتن.

**خووێن ڕژتن:** خووێن ڕژانن.*

**خووێنڕێژ:** مێرکوژ، زەراف، قاندڕ، خووێنخۆر، دەڤلخوویسن، وونرێژ، خووێنخووار، نێوی پیاوانە. ـــ ی: مرۆکوژتن.

**خووێنسار:** خووێنسارد، ناشیرین.

**خووێنسارد:** خووێنسار، ڕەزاگران، خووێن تاڵ، ناشیرین، قورس. کەسێکە درەنگ ڕقی هەستێ، لەسەرەخۆ، بەکاوەخۆ، پشوودرێژ، بێندرێژ. ـــ ی: خووینساری، درەنگ ڕق هەستان.

**خووێنساری:** خووێنساردی. پشوو درێژی، مەهوار.

**خووێن سیاوەش:** گیایەکە بە کاری زۆر نەخۆشیان دێت.

**خووێن شیرین:** ڕەزاشیرین، ئێسک سووک. ـــ ی: خووێن شیرینی، ڕەزاسووکی.

**خووێنکار:** (باک.) خووێنەخووار.

**خووێنکەر:** خووێنڕێژە.

**خووێنکەل:** دڵسۆز. ـــ ی: دڵسۆزی.

**خووێنکردن:** مرۆکوژتن.

**خووێن کردنەکاسە:** مەبەس لە ڕەشکردنی یەکێکە لە لای کەسێکی تر بە جوورێکی زۆر خراپ.

**خووینکوژاندنەوە:** مەبەس لە ئاشتی خستنە ناو دەستەیێکی مرۆکوژ و خووێنەخووا.

**خووێنگا:** خووینگە.

**خووینگ** (باک.): خوشک، خوواک، (باک.) خووە.

**خووێنگە:** شوورێنی خوێن ڕژتن، خووێنکە.

**خووێنگەرم:** لاو، جحێڵ، (موک.) بێلەنج. سادە، کەم سەلیقە. ئازا، بەجەرگ. ـــ ی: جحێڵی، لاوی، قشت و جووانی، خۆشەویستی. سادەیی، کەم سەلیقەیی. ئازایی، بەجەرگی.

**خووێنگر:** خووێنەخووا، خووێنەخووێ، خووێن ئەستێن، هوو ئەسێن، شڕەگر، خودان خووێن.

**خووێنگرتن:** خووێنە خووایی. گرتنی خووێنە لە هەندێ ئەندام بە هۆی گووێزان، نەشتەر، کەڵە شاخ و زەروو و ئیستیکان و ئیتر.

**خووێن گرسیاگ:** خووێن ڕاوەستاو.

**خووێنگر:** خووێن ئەستێن. کەسێکە لە یەکێکی تر بە هۆی نەشتەر و کەڵە شاخ و ئیستیکان و ئیتر خووێن بەربدا. ـــ ی: خووێن ئەستاندن. پیشەی خووێن بەردان لەم و لەو.

**خووێنمژ:** ستەمکار، زۆردار.

**خووێنمژتن:** خووێن مژتن.

**خووێنمژین:** خووێن مژتن.

**خووێنمژی:** زۆرداری، ستەمکاری.

**خووێنمیزکە** (بابا.): دەردێکە هەر وولاخ یا ماڵاتێکی بیگرێ خووێن دەمیزی.

**خووێننەوە:** خووێندنەوە.

**خووێنهاتن:** خوونهاتن، خووێن بەربوون.

**خووێنهەڵهێنانەوە:** بەدەم خووێن ڕشانەوە.

**خووێنی** (باک.): بکوژ، خووێنڕێژ، خووینی.

**خووێنی زگ:** چارە: مام ڕێواس بە برنجەوە بکرێتە شۆرباو تا سێ ڕۆژان سبەینان بخورێ بۆ خووێنی زگ کە لە مایەسیری و ئیتر بێ زۆر باشە.

**خووێنی کەپۆ:** کەڕابسێ چارەی ئاوایە: کلیلێکی ناوونجی ئەو سەرەی کە قفڵی پێ دەکرێتەوە بە قیتی لەسەر شادەماری پژملی دادەنرێ کەمێک پاڵی پێوە دەنرێ و دەگیرێ و سەری هەندێ بڵند دەکرێ دەست بە جێ خووینەکەڕادەوەستێ. یا کە تفنکی ڕاستی ڕابسێ چەند چرتەیەک دەستی چەپی بڵندکا ڕایدەگری کە ڕانەوەستا دەستی ڕاست بڵندکات کە هەر ڕانەوەستا هەردووک دەستی بڵندکات ڕایدەگرێ. خۆ تۆزی قورمی خانووان دوای هاڕین و دابیژتنی هەڵی مژی لە هەمووی باشترە.

**خووێنهەڵێنانەوە:** خوێن ڕشانەوە.*

**خووێنین:** خووێناوی.

**خووێهە** (باک.): ئارەقە.

**خووێهدان:** خووێدان.

**خوویسار** (دەر.): خووس، زووقم.

**خوویسان:** خووسان.

**خوویساو:** خووساو.

**خوویساوە:** خووساوە.

**خووینبەر** (باد.): کەسێکە خووێنی خۆی بەربدات.

**خووێنبەردەر** (باد.): ئەو کەسەیە خووێنی یەکێکی تر بەربدات.

**خوویل** (باک.): خێل، چتی خووار، ملێت خۆـــ کەن: ملی خۆتان کەچکەن. (باک.) خول. گومبەزی.

**خووین** (باک.): خووێن. ـــ اوی سارە.

**خوویندار** (باک.): خووێنین.

**خوویی** (ئەردە.): خۆیی، خزمایەتی.

**خووینگر** (باد.): خودان خووێن.

**خێ** (هەو.): خووێ. دەنگی تیپێکی کوردییە.

**خێبەت** (باک.): چادر، خێوەتی سپی.

**خێبشەملە:** مرۆی قوڵبنە و تێکسرماو و مل کورت.

**خیپشنە:** خیپشە ملە.

**خێت:** گێر، دێغ لەسەر قاقەز یا لەسەر زەوی، خەت.

**خێچ:** خوار، لار، چەوت، گێر، تەنها بەکارنابرێ لەگەڵ خووار بە کاردەبرێت: خووارو خێچ.

**خێچک** (شا.): خلیسکە لەسەر بەفر یا لەسەر سەهۆڵ یان لەسەر هەورازێکی لێژ.

**خێدان:** خوێدان.

**خێدانکە:** کیسەو توورەکەی خووێیە، خوێدانکە.

**خێر:** پیاوەتی، جوامێری، دفنان لە گەڵ یەکێکی یا گیانداریکی تر بە کردار یا بە گوفتار، خەیر، بە ـــ اخۆ: دەڤڵەتا سەرێ خۆ. خۆش، بە ـــ هاتن: خۆشهاتن، بە ـــ کردن: خۆشهاتن کردن، بە ـــ هاتی: خۆشهاتی.

**خێرا:** بەپەلە، بەلەز، بەتەردەستی، زوو، گورج، چوست، تەردەست، بەتالوکە، چەسپان، زیرەک، بەدەست و برد، چالاکانە. (ئەردە.): خێرەومەند.

**خێراناوێژ:** چەکێکە زوو باوێژرێت.

**خێرات:** خێر، پیاوەتی، چاکە، جووامێری.

**خێراتن:** بە خێرهاتن کردنی کەسێک، خۆشهاتن.

**خێراخۆ:** بە خێری خۆت، لە رووی پیاوەتی و مرۆڤایەتیەوە.

**خێراندار:** خێرەومەند.

**خێرو:** ئاوێکە لە شوێنێکی دوور لە ئاودا بۆ خێر دابنرێ تا رێبوار و تینووان تینوێتی خۆیانی پێ بشکێنن.

**خێرابی:** چابوکی و گورج و گۆڵی.

**خێرەسات** (خۆ.): خێڵەسات، کۆچەرات.

**خێرەوەدەر:** دوورە و خێر.

**خێرەوەمەن:** خێرەومەند.

**خێرەوەمەند:** کەسێکە زۆر خێرێ بکات و دەستی بە خشندەیی هەبێ.

**خێرەوەمەندانە:** خێرکارانە.

**خێرەوەمەندی:** خێرکاری.

**خێرخوواز:** کەسێکە هەمیشە حەز لە چاکە و خێرێ بکات. ـــ ی: خێرخوایی، چاکەکاری.*

**خێرخێر** (ئەردە.): راڕا.

**خێردار:** بەخێر. ـــ ی: بە خێرهاتن کردن.

**خێردانەوە:** بە هرە و سوودپێگەیاندن، ئەم کشتوکاڵە زۆر خێری دایەوە.

**خێرک** (باک.): خۆرە، دەردێکی پیسە. (باد.) مۆرانەی جلکان.

**خێرکا:** خێلێکی کوردانە لە کۆچەری میران.

**خێرکار:** خێرکەر. ـــ ی: خێرەومەندی.

**خێرکەر:** خێرەومەند.

**خێرکردن:** چاکەکردن.

**خێرلێ بینین:** بەهرە و کەلک دەستکەوتن لە چتێک یا لەگیان لەبەرێکەوە.

**خێرمانە** (خۆ.): جمک، دووانە، تەنها بۆ گوێز و بادام و مازوو دەبێ.

**خێرۆ:** خوورێری. شەنگڵەبەرەکەتە، سەوزاییکە بە جاری پێشووی خۆی سەوز بوویێتەوە.

**خێرۆک** (موک.): دەغلێکە بە بێ چاندن هەر لە شوێنی پارەکەی خۆی شین بوویێتەوە، (هەو.) خێلۆک، خۆرسک. ـــ ی: زگماکی، خۆرسکی.

**خێرۆیی:** خوورێتی، خۆرسکی، شین بوونەوەی کشتوکاڵێکە لە جاری پێشووی سەوز بوویێتەوە.

**خێرهاتن:** خێراتن، بەخێرهاتن.

**خێز** (باک.): خەت، دێر، (باک.) خێزک. خیز، زیخ.

**خێزان:** ژنی بەمێرد، هاوسەر، کەیوان، کەیوانوو، هاوسەنیر، خێزانی. ماڵ و منداڵ، کڵفەت، خاوخێزان. خانەوادە.

**خێزاندار:** کەسێکە ماڵ و منداڵی زۆر بێ. ـــ ی: هەبوونی ماڵ و منداڵ.

**خێزانی** (باد.): خێزان، هاوسەر، هاوسەنیر. هەژار.

**خێزەرە:** قیسپ، قەسپ. بەرچیغ، شەقڵە. (موک.، جا.) چەشنە ئالوو دارێکە بە پانی و قەراغ نەخشکراوی لە نزیک یەکتری رایەڵدەکرێن، (هەورا.) کاریتە، (بابا.) شەقڵە و چیلکو چرپیە کە لەسەر قامیش بەندی خانووان دادەنرێ.

**خێزەرەکردن** (موک.): بە زمان و قسە هورووژم بردنە سەر ...

**خێزاو:** خووزاو.

**خێزک** (باک.): خەتێکی گچکەیە.

**خێزیان** (ئەردە.): هەستان.

**خێس:** خووار، خووار و خێچ، هێس.

**خێسانەوە** (رەوا.): دڵ تێک هەڵاتن، دڵ لەخێڵەوەهاتن، دڵ تێکچوون، دڵ لەمژێلاهاتن.

**خێسەکردن:** مۆربوونەوە.

**خێشە:** مرخێش.

**خێشەخێش:** مرخێش مرخێش، وە ـــ خستن: وەمرخێش مرخێش خستن.

**خێشەک:** خوشک.

**خێشک:** تەختەی رێک و لووس کردنی شێوەرد.*

**خێڤە** (باد.): نۆبەرە (تەنها بۆ میوەیە).

**خێل:** (فە.) خل، قجر، چاولار، چاولەحەوا، چەپخوون، (باک.) چەمچک، ماکاش، چاڤشاش، (رۆژ.) تیل، چاڤ هاول، کەسێکە چاوی خووار بروانێ و یەکێکی لێ ببێتە دوو، کۆچەر، ئێل، حێل، هۆز، خێڵەسات، گرۆ، تیرە.

**خێڵ:** دڵ لە ـــ ەوەهاتن: دڵهەلاتن، (رەوا.) دڵخێسانەوە. چەندماڵێکی کۆچەرە.

**خێڵات:** رەشماڵ نشینی، خێڵەسات، کۆچەرات، خێڵ ناوەکەیە (ات) ئامرازی گەلە. ـــ ی: خێڵ نشین.

**خێلانی** (باک.): چیمەن.

**خێڵەسات:** کۆچەرات، خێڵات، خێرسات، رەشماڵ نشین.

**خێڵەوخووار:** کاتێکە لە پاییزێدا کە خێلات لـە کوێستانێوە بۆ گەرمێنی دەگەڕێنەوە.

**خێڵەوژوور:** کاتێکە لە بەهاراندا کە خێلات لـە گەرمێنەوە بەرەو کوێستان دەچمێن.

**خێڵ بەنان:** خێڵ بەندان.

**خێڵ بەندان:** خیڵ بەنان.

**خێڵۆک** (هەو.): خێرۆک.

**خێلی:** چاوخێلی، چاقیاولی. (باک.) رووبەند، پێچە. بەربووک، ئەو پیاوو ژن و ئەوانەیە کە لەگەڵ بووکی دەچنە ماڵی زاوای.

**خێمی** (هەورا.): خێوەت.

**خێن** (باک.، هەو.): خووێن.

**خێندن** (هەو.): خووێندن.

**خێو:** جندۆکە، درنج. تارمایی مردووان، (هەورا.) مێردەزمە. خاوەند، خێوی، خودان، (هەورا.) خاوەن، ماخۆ، (هەو.) ماڵخۆ. ـــ کردن: خاوەندی کردن. خاوەندی، خودانی.

**خێوان:** تێکەوتن، ڕێک کەوتن، (ڕەوا.) خێوتن، (کۆ.) پەسووان.

**خێوەت** (بابا.): چادری سپی، خیبەت، تاووک، تێۆک، خەرگا، بارەگا، (باک.) خێڤەت. ـــ ی گچکە: چاتۆڵ. ـــ ی ڕەش: ڕەشماڵ. ڕاژە، ڕێز، پەرایی، تووەدە، خزمەت، ـــ کردن: ڕاژەکردن.

**خێوترش** (کۆ.): دەنگ لێک گۆڕین.

**خێوەتکردن:** پەردەپۆشی، خێوەت دروستکردن یا هەڵدان.

**خێوەتگا:** شوێنێکە خێوەتی لێ هەڵبدرێ.

**خێوتن** (ڕەوا.): خێوان، ڕێکەوتن، ڕێک کەوتن.

**خێورانەوە** (هەو.): دڵ تێکهەڵاتن، دڵ پێکاهاتن، خێسانەوە، دڵ لـە ژیللاهاتن، دڵ کەفکردن.

**خێورانەوە** (دزە.): تووانەوە.

**خێوراندنەوە** (دزە.): تواندنەوە.

**خێوکردن:** بەخێوکردن.

**خێوی:** خێو، خاوەند، خودان، خاوەن، (هەورا.) خووەی، (هەو.) ماڵخۆ، ماخۆ، بێ ـــ: (باک.) بێ خووەوی، بێ خاوەند.

**خێوی شەو** (موک.): جندۆکە.

**خێوی هونەر:** هونەرمەند.

**خی** (ئەردە.): سەرگەرمی، کار، کاروبار.

**خیا** (باک.): تیلێکی کوردی گەورەیە، کەوتۆتە ژۆری خەزرێ.

**خیار:** خەیار، هاروێ.

**خیارچەمبەر** (هەورا.): خەیار چەمبەر.

**خیاوان** (ئەردە.): (ئەردە.) نەخیاوان.

**خیپ** (باک.): بەربەرەکانێتی خووێنین. (باک.) چاڵووک.

**خیپشنە:** گیپە، قەڵەو، گۆشتن.

**خیت** (باک.): خەت، جغز، جەغز، (باک.) چارەسازی، تەواوکردن.

**خیتەخیت** (ڕەوا.): دێغ دێغ، خەتخەت. ـــ دان: هاندان. هانکەهانک، ڕۆیشتنی نارێک، هەناسە بڕکەیەکە بە چەشنێکی ناشیرین.

**خیت خیتانێ** (هەو.): خەتخەتانێ.

**خیچ** (باک.): جیوەی داری.

**خیچە:** تۆزێک، نەختێک.

**خیچک** (باک.): ووردەبەرد.

**خیچۆ** (باک.): دێدە، خوچێ، لەکاتی ئاخەفتنیدا لەگەڵ خوشک بەکاردەبرێ.

**خیچێ** (باک.): خوچێ، خوشکێ.

**خیز:** چەو، قوم، کیلتە، زیخ، (باک.) سیلە، جەرجوو، (باک.) خێز. (هەو.) تف. (باک.) خلیسک.

**خیز خووەکرن:** خۆهەڵخلیسکاندن.

**خیزار** (باک.): شاری گەورە.

**خیزارچی:** دارتاشی.

**خیزان** (باک.): خێزان، هەژار.

**خیزاو:** ئاوخیز.

**خیزە:** دەنگێکە لـە سینگەوەدێ لـە کاتی پشوودانـدا لەبەر نەخۆشی یا ماندوویێتی، هیزە.

**خیزەخیز:** خزەخز.

**خیزەرە:** پەردووی سەر دارەڕایە.

**خیزەڵان:** زاخێران، قومسال، قومەڵان، زیخەڵان، تیرزێلاک، خیزتیر، کەرگەڤیسک.

**خیزتێر** (باک.): خیزەڵان، خیزستان.

**خیزخور** (باد.): قەراغ ئاوو چومێکە کە ئاوی هاوینان کشاوە، بکرێ بە شیناوەردی.

**خیزخیز:** خیزەخیز.

**خیزڕێژ:** زیخڕێژ، چەوڕێژ. ـــ ی: چەوڕێژی.

**خیزستان:** خیزەلان.

**خیزماڵ:** خیزەڵان، گەڤرک، گەڤیزک، گەڤزەک.

**خیزیان** (ئەردە.): هەڵسان، هەستان، بەرزبوونەوە. سەوزبوون.

**خیس** (کە.): کەسێکە شان و ملـی بـە دیـوی سینگیدا چەمابێتـەوە، خێسە، لێ مۆڕبوونەوە.

**خیسار** (بابا.): سیخووار.

**خیسکە** (خۆ.): قیسکە.

**خیشەخیش:** نیخەنیخ و دامان بە دەست چتێکەوە.

**خیشکردن:** خۆگیف کردن لە ڕقان.

**خیڤت** (باک.): خێوەت.

**خیف بوون:** پشکووتن.

**خیگـە:** شـوورتان، هـیزەی ڕۆنـی و ئـاوێ. ـــ ی لوولـەدار: (بـاک.) توورک.

**خیگـەکونە:** کوندەی کون، خێگەی لە کارکەوتوو.

**خیگۆڵکە** (ئەردە.): خیگەی گچکە.

**خیلۆک** (باک.): گیایەکە.

**خیلی** (زا.): سەرپۆش.

**خیلیسکان:** هەڵخلیسکان، خلیسکان.

**خیم** (باک.): بناغە. داکوتانی سینگ.

**خین** (هەو.): خووێن.

**خینگە** (کۆ.): گنێخە، گیپەڕە.

**خینیک** (باک.): خانوو.

# د

**د:** تیپێکی ئابێی کوردییە. دە، لە زاراوەی کرمانجیدا مرازی دانە پاڵ: ئاغایێ دمن: ئاغای دە من (ئاغای من). لە: ئەز دخووەڕامێنم: من تەماشای خۆم دەکەم. ئەڤ کەڤچک دشۆرباوێ مەنێ: ئەم کەوچکەی لە شۆرباوێ مەنێ. گولاڤ د خووەدان: گولاو لەخۆدان. لێک دبەرهەڤدان: لێکدان، بۆ تۆڵە لێکردنەوە، دبەرهەڤددەن: لێکدەدەن. بە، دهەڤدە: بەیەکەوە، دبەردە: لەپێشدا. دە، دەنێو، لەنێوەڕاست، دناڤ بازێڕدە: لەنێو بازاڕیدا. لەسەر: دپشت مندا بارێکی گرانە: لەسەر پشتی من بارێکی گرانە.

**دا:** ڕۆ، خووارەوە، لای ژێرەوە بەڵان تەنها بەکارنابرێ، دانان (ڕۆنان) داهێشتن (ڕۆهێشتن)، داگرتن( هێنانەخووارەوە). لەڕووی میهرەبانیەوە، ئەرێ، ـــ ئەم پەڕتووکەم بدەیە. (باک.) دایک، داد، دێ، دایێ، دادێ، (باک.) دیا، بۆ بانگکردنی دایک: وادا، (باک.) وادایێ. (باک.) دایک. (موک.، باک.) تا، تاکوو، بۆ ئەوەی. دەی، دادەی، ئا، دە (بۆ تێڕاخوڕینە)، ـــ وەرە لام: دە وەرە لام، داپێم بڵێ: دە پێم بڵێ. بۆ شووێنە و جێگایە: بەڵام بەدووای ووشانەوە دەنووسێ کە سەرەتایەکەیان بە (بە) یا (دە)، (لە) دەست پێ بکات: لەوێدا، بەچیدا، لەخواردندا، لەکاراندا، لە قوتابخانەدا قوتابی زیرەک زۆرن. خووارەوە، لای ژێرەوە، بەڵان بە پێشی ووشانەوە دەنووسێ، دانیشتن: نیشتنە سەرزەوی یا کورسی، دانان: نانەخوارە، داگرتن: هێنانە خووارەوە، دادڕین، دابەزین. تیپی ووریا کردنەوەیە و فەرمان و تێڕاخوڕینە: داوەرە، دا هەستە، دا بڵێ، دا دەی، دەی، دە.

**داب** (زا.): گوریسێکە لە مووی کلکی وولاخی دروستکرابێ. باو، بافت (مۆدە).

**داباراندن:** هەوور بەڕێژنە، بارانەی بە ڕێژنە ڕژتنە خووار.

**دابارانن:** داباراندن، داوارانن.

**دابارین:** بارانە بەڕێژنە سەرەوژێر، هاتنەخووار، داوارین. کۆبوونەوەی چەند کەسێک یا چەند گیاندارێک بەسەر چتێکا.

**داباش** (باک.): ئامۆژگاری، پەند، باسکردن. باس. ـــ کرن: باسکردن.

**دابان** (باک.): ناوی جووره شیرێکییە.

**دابەر** (باک.): بەسوود، بەکەلک، سوودمەند.

**دابەرزین** (زا.): سینگ ڕەپێشخستن بۆ شەڕ.

**دابەزان:** دابەزین.

**دابەزاندن:** هێنانە خووارەوەی سووار لە سەرپشتی وولاخ. داووزیاندن، (کە.) داوەزاندن، پەیاکردن، وەزەراندن، بەگژ یەکتری داهاتن.

**دابەزێن:** دابەزێنەر.

**دابەزێنەر:** ئەو کەسەیە کەسێک یا چتێکی لەپشتی وولاخی بێنێتە خووار.

**دابەزێنراو:** کەسێکە لە سوواری هێنرابێتە خووارەوە.

**دابەزین:** لە سوواری هاتنەخووار، لە شووێنێکی قۆناخ گرتن، هاتنەخووار، داوەزین، خووارەوهاتن، داخوزین، داخزین.

**دابەزیو:** کەسێکە خۆی لە سوواری پەیابووبێ و یا قۆناخی لە شووێنێکی گرتبێ.

**دابەست:** دابەستوو، دابەستە.

**دابەستە** (موک.): ڕەشە وولاخ یا ئاژاڵێکە بۆ قاوورمە لەنێو ماڵاندا بەتایبەتی بەخێو بکرێت و قەڵە و بکرێت، دابەستوو، (هەو.) دابەستی. (شا.) لەنێو جۆگەی لێژدا چەند پلەیەکە لە لکەدارانی بە پەلکەوە لەگەڵ بەردی و گلێ دروستدەکرێ تا دای نەدڕێ.

**دابەستن:** ـــ ی ڕەشە وولاخ و ئاژاڵ، بەتایبەتی بەخێوکردنیانە بۆ قاوورمە. ڕاداشتن، نووێژ ـــ : واتە دەست بەنووێژکردن، ـــ ی تۆپ: واتا ئامادەکردنی تۆپە بۆ ئاوێژتنی، بەستنی چتێک بەچتێکی ترەوە: پاشکۆیەکەی دابەست، بەستنەوە، ـــ ی بار: بەستن.

**دابەستوو:** ڕەشە وولاخ یا ئاژاڵێکە بەتایبەتی بۆ قاوورمە بەخێو بکرێ، (ڕۆژ.) دانی، دابەستە، کوشتی، (هەو.) دابەستی.

**دابەستی** (هەو.): دابەستوو، دابەستە، کوشتی.

**دابەش:** پەخش، (کۆ.) دارەبەش. ـــ بوون: بەشبوون.

**دابەشەر:** دابەشکار، دابەشکەر.

**دابەشکەر:** دابەشەر، بەشکار، پەخشێن، دابەشێن.

**دابەشکردن:** بەشکردن، (باک.) دگوولیک. بەشبەشکردنی چتێکە بەسەر چەند چتێکیدا: باوکی منداڵەکانی دەراوسێمان مرد و ماڵەکەشیان بەسەر خۆیاندا دابەشیەوە.

**دابەشێن:** دابەشێنەوە، دابەشکار.

**دابەشین:** بەشکردن، بەشینەوە، پەخشکردن.

**دابەشینەوە:** دابەشین.

**دابەلاندن** (زا.): قووتدان.

**دابەلیاندن** (باک.): قووتدان.

**دابدیم** (ئەردە.): دەبدیم.

**دابڕ:** دابەشەر، بەشەر، بەشکەر. داگیرکار. بۆر، ڤێرگول، فارزە( ،). جووره گەمەیەکە.

**دابڕان:** دابڕکران، لێک جووێ بوونەوە، ژێ بوون؛ مەڕەکە لە ڕانەکە دابڕا، هەڵبڕا، بەرخەکە لەدایکی دابڕا.

**دابڕاندن:** دابڕین، لێک جووێ کردنەوە.

**دابڕاو:** هەڵبڕاو، لێک جوێبووەوە. بێ بەشکراو، بەشبڕاو.

**دابڕدان:** هەڵاوەردن، دابڕین، دابڕاندن، جوێکردنەوە، لێکهەڵاوەردن، پارچە ئاژاڵێک لە مێگەلێکی هەڵاوەردن.

**دابڕدن:** بڕکردنی چتێک لە چتێک. بردنە خووار، هەڵکەندن، داچەقاندن.

**دابڕکردن:** جوێکردنەوەی چتێک لە چتێکی تر. زەوتکردن.

**دابڕین:** هەڵاوەردن، جوێکردنەوە، بڕدان، لایەکی لەخانووەکەم دابڕی، داهاووردن، دابڕکردن. بڕین: چەقۆیەکە یا قەڵەمبڕەکە دەستی دابڕیم، (باک.) زیان پڕکردنەوە، زیان وەلانان. لە لە کردنی چتێک.

**دابگردن** (ئەردە.): ڕەت بوون، تێپەڕین.

**دابنارتن** (باک.): چەقاندن، بەرپاکردن.

**دابۆڕاندن** (باک.): تێپەڕاندن.

**دابۆڕین** (باک.): تێپەڕین.

**دابوون:** داچوون، چاڵ بوون، (موک.) خۆ نزم کردن، خۆ چەماندنەوە لە گەمەدا، سەرقەلانکردن و پشت دانەواندن لە هەندێک گەمەدا لەکاتی تێکەوتن و دۆڕاندنێدا. (زەن.) داڕسانی خووێنی لووت.

**دابێژ:** ئەو کەسەیە ئارد و دەغڵ و چتی تر دادەبێژێ.

**دابێژان:** وێژان، شەردان، بێژانەوەی دانەوێڵە و ئارد و ئیتر بە هێڵەک و بێژنگ و سەرەند و ئیتر. کونکون بوونی چت بەهۆی گوللەبارانە و یا مۆرانەوە.

**دابێژاندن:** دابێژتن.

**دابێژتن:** بێژتن، بێژان، شەرداندن، (دەر.) وێژاندن، پێژتن، بێژتنی ئارد و دەغڵ و دان.

**دابێژدابێژ:** چتێکە کونکون بووبێ.

**دابێنان** (باد.): دابەستن، دابەستی. سەری قەرتاڵە و سەوەتەی پڕ لەمیوە بە گیاولکەداران بەستن.

**دابین:** تاقەت، ئارام، هێمن، هێدی. ـــ بوون: داکەوتن، هێدی و ئارام بوون، ژیربوونەوە، تاقەت بوون، ـــ کردن: بەزاندن، هێدی و ئارام کردنەوە، تاقەت کردن، دامەزراندن.

**دابینکەر:** هێمنکەر، فستۆق. ـــ ی: هێمن کردن، ئارام کردنەوە.

**داپاچان:** داتاشان، هەڵپاچان (بۆ دیوار و کەنداڵ و دار و ئیتر).

**داپاچاندن:** داتاشین، هەڵپاچین (بۆ دیوار و کەنداڵ و دار و ئیتر).

**داپاچەر:** داتاشەر، هەڵپاچەر.

**داپاچێن:** داهێنەر و هەڵپاچێن و هەڵقەتێنی لک و پۆپی درەختان.

**داپاچین:** داهێنان، پاچین، هەڵپاچین، هەلقرتاندن، هەڵپەرداوتنی لک و پۆپی دار و درەخت یا تووک و موو. کەمکردنەوە.

**داپەڕ:** کەسێکە بۆلای خووارەوە بپەڕێ، ببەزێتە لای ژێرەوە، هەڵپەڕ داپەڕ.

**داپەڕان:** ڕاپەڕان، داچڵەکان، داپەڕین.

**داپەڕاندن:** ڕاپەڕاندن، داچلەکاندن.

**داپەرە** (باک.): پارچە دراوێکی دەپارەییە.

**داپەڕین:** ڕاپەڕان، ڕاپەڕین، داچڵەکان، ڕاچەنین، ڕاچڵەکین، پەڕین، (ئەردە.) پەڕینە لای خووارەوە. هاتنە خووارەوەی گیاندارێکە بە گورجی لە بڵندییەوە بۆ خوارێ.

**داپەڕیو:** ڕاپەڕیو، ڕاچەنیو.

**داپەستان:** ئاخنینەوە، پەستان، پەستینەوە، پەستانەوە.

**داپەستانەوە:** پەستانەوە.

**داپەستاوتن:** پەستاوتن، داپەستن، داگرتن، پەستن، ئاخنینەوە، داپەستان.

**داپەستران:** ئاخنرانەوە، پەستران.

**داپەستراو:** ئاخنراو، هەڵاخنراو.

**داپەستوو:** پەستراو، داپەستراو.

**داپەڵۆسان:** داپڵۆسان.

**داپەڵۆساندن:** داپڵۆساندن.

**داپەڵۆسین:** داپڵۆسین.

**داپەنەمین** (ئەردە.): پەغین، خەفتن، نوستن.

**داپەنمان:** پەغان.

**داپچڕان:** داچەقان و دەمدانەوەی چاوو دەم و هێندێ چتی دیکە.

**داپچڕاندن:** داچەقاندن و دەمدانەوەی هێندێ چت.

**داپچڕین:** داپچڕاندن.

**داپڕژان:** پەرش و بڵاوبوونەوە.

**داپڕژاندن:** پەخش و بڵاوکردنەوە.

**داپرووزقان** (ئەردە.): داپرووسقان.

**داپرووزقاندن** (ئەردە.): داڕووتاندن، داماڵین.

**داپرووزقانن** (ئەردە.): داڕووتاندن.

**داپرووزقیان** (ئەردە.): داڕووتان، داماڵران.

**داپرووسقان** (ئەردە.): داڕووتان.

**داپرووسقاندن** (ئەردە.): داڕووتاندن.

**داپرووسقانن** (ئەردە.): داڕووتاندن.

**داپرووسقیان** (ئەردە.): داڕووتان.

**داپژان:** ڕژان، پژان، بڵاوبوونەوەی دەغل و دان و دانەوێڵە.

**داپژاندن:** ڕژاندن، بڵاوکردنەوەی دەغل و دان و دانەوێڵە.

**داپسکیان** (ئەردە.): فسدانی مریشک بۆ کەڵەشێر.

**داپسیان** (ئەردە.): داپسکیان، دانەوین، دانەوان. فس خوواردنی مریشک بۆ کەڵەباب.

**داپڵان:** درکان، درکێنران.

**داپڵاندن** (کە.): درکاندن، دەربڕین.

**داپلۆخان:** تولانەوە، پلیخانەوە، ڕزانەوە، پرتکیان، پەتشان، سووتان و داماڵانی شووێنێک لە لەش بەهۆی ئاگر یا ئاوی کوڵاوەوە.

**داپلۆخاندن:** تولاندنەوە، پلیخاندنەوە، ڕزاندنەوە، پرتکیاندن، سووتاندن و داماڵینی شووێنێک لە لەش بەهۆی ئاوور یا ئاوی کوڵاوەوە.

**داپلۆخین:** داپلۆخان.

**داپڵۆسان:** داپەڵۆسان.

**داپڵۆساندن:** داپەڵۆساندن، داپڵۆستن.

**داپڵۆستن:** داپڵۆساندن، لێدان، بە چەپۆکی بەسەرداماڵین، داپڵۆسین.

**داپڵۆسکان** (ئەردە.): داڕووتان.

**داپڵۆسکاندن** (ئەردە.): داڕووتاندن، ڕووتکردنەوە.

**داپڵۆسکانن** (ئەردە.): داپڵۆسکاندن.

**داپڵۆسکیان** (ئەردە.): ڕووت بوونەوە، داڕووتان.

**داپڵۆسێن:** ڕووتکەر، جەردە، داپڵۆسەر.

**داپڵۆسین:** ڕووتکردن، ڕووتاندنەوە، داپەڵۆسین، داگرتنی یەکێک بە لێدانی یەک لەسەر یەکتری. بە چەپۆکی بەسەر و گوێلاکی کەسێکیدا ماڵین.

**داپۆش:** داپۆشەر.

**داپۆشان:** داپۆشتن، داپۆشین.

**داپۆشاندن:** داپۆشین، داپۆشان.

**داپۆشانن:** داپۆشاندن.

**داپۆشەر:** داپۆش، شێرەوە، شارەوە، داپۆشێن.

**داپۆشەڵ:** داپۆشەر.

**داپۆشتن:** داپۆشین، داپۆشتن.

**داپۆشران:** پۆشران، تەڤزان، سەتمین، زارگیران.

**داپۆشراو:** پۆشراو، (باک.) تاتک، شلیماتک.

**داپۆشێن:** داپۆشەر.

**داپۆشین:** داپۆشتن، سەرنانەوە، زارنانەوە، پەنهانکردن، شاردنەوەی چتێک بەچتێک بەسەردادانیدا، لێفە یا پەردە یا سەرپۆش بەسەردادان، ڕاپاندن، نخافتن، (جەبا.) باندان، داکوڕین، حاشاردان، پێداگرتن، تەڤزاندن، سەتماندن، شاردنەوەی قسە یا نهێنی کەسێکی، گەرم ــــ : نخاندن.

**داپۆشینەوە:** دووبارە داپۆشین، نخوماندن.

**داپۆی** (هەورا.): پێوەدان (بۆ دەرک و پەنجەرە و مار و دووپشک و ئیتر).

**داپیچ** (ڕۆژ.): کەم.

**داپێچان:** پێچان، پێچانەوە، پێچانی چتێک بەسەر چتێکی تردا، یا چتێک لەسەر باری بەستن.

**داپێچاندن:** پێچان، داپێچان.

**داپێچانن:** داپێچان، داپێچاندن، بەستن. ڕەپیپچەک دان، ڕاڕفاندنی چتێکە بەهۆی ناوەوە.

**داپیر** (هەو.، لو.، فە.، ڕەوا.، باک.): نەنک، داپیرە.

**داپیرە:** نەنک.

**داپیرحوولک** (ڕەوا.): داعبایەکی کەڵکەڵەییە منداڵی پێدەترسێنن، کە بچێتە شوێنێکی بقەدار یا هەڵدێر یا تاریک پێی دەڵێن مەچۆ ــــ ی لێیە.

**داپیرک** (باد.): مامان.

**داپیرۆچک** (خۆ.، ڕەوا.): داپیرۆشکە، جاڵجاڵۆکە. (خۆ.) پەنیرگشت.

داپیرۆچک

**داپیرۆشکە** (ڕەوا.): جاڵجاڵۆکە.

**داپیرۆکە** (ڕەوا.): جاڵجاڵۆکە.

**داتاشران:** ساختەبوون.

**داتاشراو:** ساختە. چتێکە تاشرابێ.

**داتاشین:** تاشینە خووارەوە، داتاشرینە خووارەوە، داپاچین، پاچین. ساختەکردن. دروستکردنی ووشەیەک لەووشەیەک.

**داتەپان:** ڕووخان، تەپین، تەپان، ڕۆچوون، داهاتن.

**داتەپاندن:** ڕووخاندن، تەپاندن، ڕۆچوواندن، داهێناندن، دائماندن.

**داتەپین:** تەپین، ڕۆچوونی زەوی سستەک و سەربان و ئیتر، دائمان، داتەپان، داهاتن، نزم بوونەوە و داتسانی بان و گوێسووانە. مەبەس لە پیربوون و بەناواچوونی گیاندار.

**داتەپیو:** ڕۆچوو، تەپیو.

**داتەقاندن:** بەپەلە و دەستوبرد نوێژکردن: نوێژەکەت داتەقێنە.

**داتەکان:** تەکان، داوەشان، بەتاڵ کران.

**داتەکاندن:** بەتاڵکردن، تەکاندن، داوەشاندن، ڕاوەشاندنی هێندێ شت سەربەرە و خووار بەچەشنێک، کە هیچی تێدا نەمێنێ، هەژاندنی لکی داران بۆ وەرین و کەوتنە خووارەوەی بەرەکەی.

**داتەکانن:** داتەکاندنی بەرگ و مافوورە و ئیتر. بەتاڵ کردن، هیچ لەناو دەفر یا جەواڵ و ئیتر نەهێشتن.

**داتەکاو:** تەکاو، داتەکێنراو.

**داتەکیان** (ئەردە.): داتەکین، بەتاڵ بوون.

**داتەکین:** مەبەس لەنابووت بوونی مەردومە، ئەوەندەم لەبازاڕ چتمەک کڕی داتەکیم، واتە هیچم نەما. بەتاڵ بوونی ئامانی پڕ لە چت، کە هیچی تێدا نەمێنێ. بۆ پیربوون و لە ناوەوە چوونی گیانداریش بەکاردەبرێ.

**داتەمریان:** دامرکان.

**داتەمیان** (ئەردە.): داتەمین، تەمین، تمیان، پشێویان، پشێوبوون.

**داتەمین** (ئەردە.): خەم و تەم و خەفەت داگرتنی کەسێک، داتەمیان.

**داترازان:** لێک هەڵبڕان. ترازان.

**داترازاندن:** لێک هەڵبڕاندن.

**داترازاو:** ترازاو.

**داتراشان:** تراشان.

**داتراشاندن:** تراشین.

**داتراشاو:** تراشاو.

**داتروسکان:** تروسکانەوە. داچڵەکین.

**داتروسکاندن:** تروسکاندنەوە، داتروسکانن.

**داتروسکانن:** داتروسکاندن. داچڵەکاندن، ترساندن.

**داتروسکیان:** داتروسکان.

**داتسیان:** داتەپین.

**داتسین:** داتەپین.

**داتفان:** تف کران.

**داتفاندن:** تفاندنەوەی ئەو چتەی، کە لەناو زاردا بێ، تف کردنەوە.

**داتلیشان:** تیتۆڵ تیتۆڵ و ریندۆڵ ریندۆڵ بوون، دران، پارچەبوون، دادران، تلیشانی هەندێ چت لەباری درێژیدا.

**داتلیشاندن:** دادراندن، تلیشاندن و لەتکردنی هێندێ چت لە باری درێژی، دادرین.

**داتلیشانن:** داتلیشاندن.

**داتلیشیان:** تلیشان.

**داتووراندن** (ئەردە.): تووراندن، تووراندن، فیراندن، زگ چوون.

**داتوروسکان:** ترسان و راچەنینی گیاندار.

**داتوروسکاندن:** ترساندن و داچڵەکاندن.

**داتوروسکیان:** ترسان، زراوچوون.

**داجمان** (کە.): کەوتنەرێگا، وەرێکەوتن.

**داجماندن:** جوولاندن، وەرێخستن.

**داجووین:** جوویین، رژیین، رۆیشتن.

**داچاندن** (موک.): چاندن، (موک.) وەشاندن، تۆوەشاندن بەزەویدا، چین لەسەر چین دانانی هێندێ چت.

**داچەقان:** ناوەڵەبوون (بۆ زار و ئێخە و ئیتر)، داچەقین.

**داچەقاندن:** ناوەڵەکردن (بۆ زار و ئێخە و ئیتر)، ئێخەکردنەوە، داپچراندن. بردنە خوارەوەی چتێک بەچتێکی تردا، بەنهێم وەکوو بزمار بە دار و زەویدا.

**داچەقانن:** داچەقاندن، چەقاندن، تێرۆکردن. (ئەردە.) چەقاندنی دار و قەڵەم. داچەقاندن، ناوەڵەکردنی زار و ئێخە و شوێنی تر.

**داچەقیان** (ئەردە.): داچەقان.

**داچەقین:** چەقینی چتێک بە چتێکی تردا.

**داچەکان:** نارێکی و خووار و خێچی شان و مل.

**داچەکاو:** شان و ملی نارێکی خووار و خێچ.

**داچەکین:** داچەکان، راپەرین.

**داچەڵەکان:** داچڵەکان، راپەرین.

**داچەڵەکاندن:** راپەراندن.

**داچەمان:** داچەمین، کووربوونەوە، چەمانەوە، چەمینەوە.

**داچەماندن:** کوورکردنەوە، چەماندنەوە.

**داچەمین:** چەمانەوە، چەمینەوە، داچەمان، کووربوونەوە.

**داچەندن:** داچاندن.

**داچزان:** چزانی شوێنێک لە ئەندام بە ئاگر یا بە چتێکی داغ.

**داچزاندن:** سووتاندنی شوێنێک لە ئەندام بە ئاگر یا بە چتێکی داغ.

**داچکان:** چەقان.

**داچکاندن:** چەقاندن، چاندن.

**داچکیلان:** چەقان، چەقین، چاندران.

**داچکیلاندن:** چاندن، چەقاندن، داچکاندن.

**داچڵەکان:** داپەران، (رۆژ.) داچەڵەکان، چڵەکان، شڵەژان، خوورپان، داخورپان. داتروسکان.

**داچڵەکاندن:** داپەراندن، شڵەژاندن، داخورپاندن، چڵەکاندن، خورپاندن، راپەراندن. داتروسکاندن.

**داچڵەکانن:** راچەناندن.

**داچڵەکیان:** داچڵەکین، ترسان، بێداری، ووشیاربوونەوە.

**داچڵەکین:** داچکەکان.

**داچمان:** راپەرین.

**داچماندن:** راپەراندن، ترساندن.

**داچناندن** (باک.): چنینەوە، کۆکردنەوە. هەڵکردن و هەڵپێچانی قۆڵ و داوێن.

**داچنین** (باک.): کۆکردنەوە، هەڵکردن، چنین و رێزکردنی چتێک لەسەر چتێکی تر. هەڵپێچان. (ئەردە.) هێنانەخووار.

**داچۆڕان:** هاتنەخووارەوەی چتێکی شل لە چتێکی تر، چۆڕانەوە، تنۆکەتنۆکە یا بەرێچکە رژانە خووارەوەی شلەمەنی، (رۆژ.) هەڵنیشتنی باڵندە و فرۆکە و ئیتر.

**داچۆڕانەوە:** چۆڕانەوەی ناو لەکیسەی تۆراخ و چتی تەڕ.

**داچۆڕاندن:** چۆڕاندنەوە، چک کردن، خووارکردنەوەی ئامانێک بۆ هاتنەخوارەوەی چتێکی شل لەوی بەمەرجێک، کە هیچی تێدا نەمێنێ.

**داچۆڕانن:** داچۆڕاندن.

**داچۆڕەر** (رۆژ.): ئەو کەسەیە، کە شلەمەنی بچۆڕێنێتەوە. ئەو گیان لەبەر و باڵندانەیە، کە لەسەرەوە بۆلای خووارەوە هەڵبنیشێ.

**داچۆڕیان:** چۆڕانەوە، داچۆڕان.

**داچۆڕین:** چۆڕانەوە، داچۆڕان.

**داچوون:** هاتنەخووار، رۆچوون، بەقوولاییدا چوونەخووارەوە بەزەوی و شوێنانی تردا. پێداچوون: تێراچوون، تێ هەڵچەقان. درێژەپێدان.

**داچێنە:** واتە لەگەڵ گۆشت و تەماتە کە چین چین دای نێی. بچینە.

**داچێن:** تۆوچێن، تۆوەشێن، ئەو کەسەیە، کە تۆوی لەزەوی و زار و بیستاناندا بچێنێ، یا بیکوڵێ و بچێنێ.

**داچێنران:** چاندران.

**داچێنراو:** چێنراو.

**داحبا:** جانەوەر، درندە، زیندەوار.

**داحلاندن:** داهێشتن.

**داخ:** ئاخ، سووێ، سوو، دەرد، پەرۆش، رۆ، ئەیرۆ، ئایرۆ، خەفەت، ووشەیەکە بەهۆی ویەوە خەفەتی دەروون دەردەبڕێ. ــ لە دەست رۆژگار، کەسەر، ئەهار، جخار، جەخار. ــ خووار دن: پەرۆشداربوون. ــ دار: پەرۆشدار، چای ــ: داغ، زۆرگەرم. (خۆ.) دێر، خەت، دێخ، بۆچووم. داغی ئاژاڵ و ماڵاتان، ئاسنێکی سوورکراوەوەیە بە شوێنی بەنێش و ژانداری لەشی گیان لەبەریانەوە دەنێن یا بۆ نیشانەکردن یا بۆ سزادان. بەو ئاسنەش دەڵێن کە سەری پانە و ئەندامی گیان لەبەرانی پێ داغ

دەکەن. نیشانە. کێو، بەڵان بەتەنێ بەکارنابرێت بەڵکو لەگەڵ (شاخ) بەکاردەبرێت: شاخ و داخ.

**داخاز** (باد.): داخوواز، داوخوواز، دڵخوواز، ئاوات.

**داخازتن** (باد.): داخووازتن، داوخووازتن، ئاواتخووازتن.

**داخان**: پەرت و بڵاو، پەخش و بڵاو، وێران. ـــ بوون: وێران بوون. ـــ کردن: وێران کردن.

**داخەر**: کەسێ یا چتێکە، کە دەرگا و پەنجەرە و قوتوو و سندووق و چتی تر داخات. ڕاخەر.

**داخەکەم**: بە پەرۆشەوە، حەیف، دەستی شکاوم، وای لەمن، پەرۆش، والمن ئەزۆ، پەکوو، داخم ناچی، داخی گرانم، داخی داخانم، ئاخ، داخی دڵم، بەداخەوە، داخی بەجەرگم، ووشەیەکە بۆ دەربڕینی خەفەت بەکاردەبرێ.

**داخداخ**: دێخ دێخ.

**داخدار**: نەھارەزگ، داغ لەزگ، خەمبار. ـــ ی: داغ لەزگی، خەمباری.*

**داخران**: بەستران، بەسترانی دەرک و پەنجەرە و ئیتر. ڕاخران.

**داخراو**: داخستراو، ڕاخسراو، دەرگا و پەنجەرەی هەڵ پێکراو، چتی فڕێدراو.

**داخرپیان**: داخورپیان.

**داخرمان** (ڕۆژ.): داکرمان، کرۆژران.

**داخرماندن** (ڕۆژ.): داکرماندن، کرۆژتن، بۆ قەند و برێشکە و چتی وا.

**داخرماو**: داکرماو، کرۆژراو.

**داخریاگ** (ئەردە.): داخراو، ڕاخراو. فڕێدراو. کەوتوو.

**داخزان**: داخزین، ترازان و خلیسکانی چتێک لە شوێنێک.

**داخزاندن**: خزاندن، ترازاندن، هەڵخلیسکاندن.

**داخزاو**: تێخزاو.

**داخزین**: داخزان، خزان، خزین، تێخزان، خوشین.

**داخستراو**: داخزاو، خزاو، خوشیو. ڕاخراو، داخراو.

**داخستن**: لەدەست کەوتن، گاڵەدان، دایەخستن، دادان. کلۆم کردن، قایم کردن، دەرگابەستن، ئەرەووستەی قاپکردنی، ئەڵقە ڕێز و قفڵ و شمشیرە (گۆڵە) ی دەرگا و چتی تر. لێدان. ڕاخستنی ڕایێخ و حەسیر و چتی تر، (هەورا.) ئەرەووستەی هێنانەخووار و دادانەوەی پەردە و ئیتر. نزمکردن، بردنەخووارەوە، هەڵکەندن و چاڵکردنی شوێنێک لەزەوی (بناغەی دیوارەکەی داخست). تەندوور ـــ: ئاوور تێدا کردنەوە و گەرمکردن. فڕێدان. بڕین، داپاچین. داشکاندن، بەرەڵاکردنی ئاو.

**داخشان**: خوشین.

**داخشاندن**: بەزەوی داخشاندن. (باک.) چاوپێ هەڵنەھاتن.

**داخکەردەی** (هەورا.): داغکردن.

**داخکردن**: سووتاندنی شوێنێکی گیاندار بە شیشەیێکی سوورەوەکراو یا گەرم، گوێچکەی بۆ ناسینەوەیە و لاقەبرغەی چارەیێ بۆ نەھێشتنی ژان و برک و ئیتر. گەرمکردن و قرچاندنی ڕۆن لەسەر ئاوور، داغ کردن. دێخ کردن. کوڵاندن، جۆشاندن، گەرمکردن. نیشانەکردن. گوڵ لێدان، لەخشتەبردن.

**داخکێشان**: ئاخ کێشان، پەرۆش بوون.

**داخگا**: شوێنی داغ. شوێنی دیغ و دێخات.

**داخ لەدڵ**: کەسێکە دڵی پڕێ لەدەرد و چەخار بەهۆی هەرچتێکەوە.

**داخلێ** (باک.) بەرکێشک.

**داخمە**: داغمە، دەخمە، تەمخە، دروشمێکە بە ئاژاڵانەوە دەنرێ تا بزر نەبێ.

**داخم ناچێ**: داخەکەم.

**داخ ناوتووێڵ** (ئەردە.): چینی نێوچاوان.

**داخۆ**: داخووا، ئاخۆ، (کە.، باد.) ئەیە.

**داخۆم**: داخووا، ئایا.

**داخوو**: داخووا، ئایا.

**داخووا**: داخوو، (کە.، باد.) ئەیە، قاتی، هەیاران، داخۆ، چما، چمان، ئایا، ئەرێ، (بابا.) ئاخۆ. دادخودایە، هاوارخودایە.

**داخوواز**: بخوواز، کەسێکە چتێکی بووێ و هەوڵی بۆبدا. ئارەزوو، ئاوات، دڵخوواز، داوخوواز، هەڵوەستاو، کرپار، واتا، مەبەس، ویست، خووازبێنی. ـــ کردن: خووازبێنی کردن، ژنخووازتن. ـــ ی: ویستنی چتێک و بۆی هەوڵدان. چتێکە، کە بەدوایدا دەگەڕێ.

**داخووست**: ویست، خوواست.

**داخووستن**: خوواستن، ویستن

**داخ و دوخان** (ئەردە.): خەم و خەفەت.

**داخووران**: دارووخان و کەلەبەر تێکەوتنی شوێنێک لەسەرەوە بۆ خووارەوە: ئەم خانووە داخووراوە.

**داخووراو**: دارووخاو، کەلەبەر تێکەوتوو.

**داخورپان**: خورپە لە دڵکەوتن، دڵخورپان، ڕاچەنین، خورپان، چڵەکان، داچڵەکان، داخورپان.

**داخورپاندن**: چڵەکاندن، داچڵەکاندن، خورپە لە دڵکەوتن، دڵخورپاندن، داترووسکاندن.

**داخورپاو**: داچڵەکاو، خورپە لە دڵکەوتوو.

**داخورپیان** (ئەردە.): داخورپان، داچڵەکان.

**داخورت** (باک.): فاڵگرتنەوە، لەنهێنی دووان، دەربڕینی ڕازێکە لە پێش ڕوودانیدا.

**داخورین**: تیراخورین، گرماندن، گوڕڕاندن.

**داخوزین** (ئەردە.): لەسوواری وولاخیەوە دابەزین، هاتنەخووار.

**داخوستن** (ئەردە.): داخوزین.

**داخوشان**: خوشان.

**داخوشین**: خوشین.

**داخۆم** (ئەردە.): داخۆ، ئاخۆ، ئایا، داخووم، داخوو.

**داخی بەجەرگم**: داخی دڵم، داخی داخانم، داخی گرانم، پەککوو، حەیف، ئاخ، ئۆخ.

**داخی داخانم**: داخی بەجەرگم.

**داخی دڵم**: داخی بەجەرگم.

**داخی گرانم:** داخی بەجەرگم.

**داد:** بەجێ، بەجێگا. قیژین، فەریاد، هەللا، هاوار، هاواروداد، گازندە، شکایەت: ـــ لە دەست بێگانە، (باک.) دایک.

**دادا** (رۆژ.، لو.): نەنک. (ئەردە.) دایک. تایەن، دەدە.

**دادار:** خوڕا، خودا.

**دادان:** هاتنەخوار ونیشتنی باڵندە و فڕۆکە. دادانەوە، هێنانەخوارەوە، لێ هاتنەخوارەوە و تکان، دەلاندن، توورە کە ماستە کە ئاوێ دەدەڵێنی، ـــ ی بارانە: دەست بەبارینێ کردن، ـــ ی دڵۆپە: دەست بەدڵۆپە کردن، ـــ ی گۆرەوی و ئیتر: دەست بە چنینی کردن، مەشق ـــ: سەرمەشق نووسین، دێرێک لەسەرەوەی قاقەزێک نوسین تا قوتابی لەبەری بنووسێتەوە، ـــ ی پێنووس: سەری پێنووسی قورقوشم تیژ و خۆشکردن بۆ نووسین، تاشین، ـــ ی ئارد و گەنم و ئیتر لە هێلەک و بێژنگ مەبەس لە لێ هاتنە خوارییەتی، دادان، بەسەر ـــ: دانەسەر. (باک.) پێوەدان، داخستن، ئاوورکردنەوە، هەڵکردن، بەخۆ ـــ: بەسەر خۆ و ئیتر دادانی پەردە، لێفە، سەرپۆش، چارشێو و ئیتر.

**دادانەوە:** هێنانەخوارەوەی پەردە و ئیتر، شۆڕکردنەوەی هەر چتێکی بێ. ـــ ی پێنووس: دووبارە خۆشکردنەوەی سەری پێنووسە بۆ نووسین. ـــ ی بارانە و بەفر: مەبەس لە جاری دووەم و پتری بارینی وانە. ـــ ی قۆڵ و داوێن: هێنانەخوارەوە، شۆڕکردنەوە.

**دادە** (هەورا.): دێدە لە رووی ڕێزەوە بۆ خوشکی گەورە بەکاردەبرێت، خوچە، خوچێ، (ئەردە.) بۆ دایکیش بەکاردەبرێ.

**دادەک** (باک.): جوورە درەختێکە.

**دادەی:** (بابا.) ئادەی. دەی، دا، دە، بۆ فەرمان و تێراخوڕینە بە پێش ووشە و ڕستانەوە دەنووسێ سا مەبەس لەنیشاندان بێ یا دانەدەست.

**دادبەر:** گازندەکار، گلیڤان، کەسێکە گلەیی بەرێتە بەر یەکێکی یا دادپرسێک.

**دادپەرس** (هەورا.): دادپەرست، دادپرس.

**دادپەرست:** دادپەروەر. ـــ ن: دادپەروەری. ـــ ی: دادپەروەری.

**دادپەرسی** (هەورا.): دادپەرست، دادپرسی.

**دادپەروەر:** دادپەرست، دادپەرس، کەسێکە دژی زۆر و بێدادی و ستەم بێ.

**دادپەروەرانە:** دادپەرستانە.

**دادپەروەری:** دادپەرستی.

**دادپرس:** دادپرسیار، کەسێکە بەدادی لێقەوماو و گازندەکاران ڕابگا، مافپرس.

**دادپرستەی** (هەورا.): دادپرسین.

**دادپرسی:** دادپرسیاری.

**دادخوا:** دادخواز، دادبەر.

**دادخواز:** داواکار، کەنۆ، دادبەر، کومکافر، دادخوا. ـــ ی: دادخوایی، سکاڵاکردن.

**دادخوایی:** دادخوازی.

**دادڕان:** دڕان، تلیشان، هەڵتلیشان، دڕانی کەل و پەل لەسەر باری درێژی.

**دادڕاندن:** داتلیشاندن، دڕاندن، هەڵتلیشاندن، تلیشاندن.

**دادڕاو:** داتلیشاو، تلیشاو، دڕاو.

**دادرەس:** بەهاناوەگەیشتوو، بەهاناوەهاتوو، فەریاد ڕەس، کاربەدەس. ـــ ی: فەریاد ڕەسی، هاوار و دادەوە گەیشتن.

**دادڕدادڕ:** کاڵایەکە لەگەڵێ لاوە سەربەرە و خووار دڕا بێ. شووێنێکە لە زەوی کە ناو بەناو ئاو دایدڕی بێ.

**دادڕوون:** دروونی چتێک بەسەر چتێکی تردا. مەبەس لە خەنجەر لە یەکێک دانیش لە کەسێکی.

**دادڕێن:** ئەو کەسەیە چتی دادڕێ، دادڕ، دادڕەر، دڕێن.

**دادڕین:** دڕاندن، داتلیشاندن، تلیشاندن، دڕین، دڕانی چت لەسەر باری درێژی، دڕاندنێکە لەسەرڕا بۆ خووارەوە.

**دادڤان** (باد.): دادوان. ـــ ی (باک.): دادوانی.

**دادک** (باک.): دایک.

**دادگا:** دادگە، دیوانی داد و هاوار و گلەیی پرسین.

**دادگە:** دادگا، شووێنێکە داد و گازاندەی ببرێتێ و دادوانی تێدابێ.

**دادگەر:** دادپرسی.

**دادنووس:** کەسێکە، کە بەسەر گلەیی ئەم و ئەو ڕابگا. ـــ ی: نووسینی داد و گلەیی.

**دادۆ** (باک.): دادێ، (باک.) دا، لەکاتی بانگ کردنی دایکیدا بەکاردەبرێ.

**دادوان:** کەسێکە لەگلەیی و گازاندەی گشتی بکۆڵێتەوە، دادپرس. ـــ ی: کردار و فەرمانی کەسێکە کە لەگلەیی و گازاندەی گشتی بکۆڵێتەوە.

**دادوەر:** دادپرس، حاکم.

**دادوەری:** دادپرسی. بەسەر گلەیی و گازاندەی لێ قەوماوان ڕاگەیشتن و بەفریایان کەوتن.

**داد و بسەد:** کڕین و فرۆشتن. (ئەردە.) داد و بست.

**دادوبست** (ئەردە.): کڕین و فرۆشتن، خرید و فرۆش.

**دادوبێداد:** هاواروداد، هەرا.

**دادووران:** درووان.

**دادووراندن:** دروون، دووراندن.

**دادووراین:** دادووراندن.

**دادوڕۆڕۆ:** دادو هاوار.

**دادۆشین:** ئاژاڵ و ماڵاتان و گیانداران دۆشین بەنهێم، لەناو ئاوی گەرمدا دەست بە ئەندامی لە جێ چوو داهێنان تا بێتەوە جێگای خۆی. گووێ بڕی کردن، گیرفان تەکاندن، دەستبڕین، داڕووتاندنی مرۆڤ بەناخونەک.

**دادوفوغان:** داد و هاوار، کرووزانەوە.

**دادوهاوار:** داد و ڕۆڕۆ، هاواروداد، زارەزار، زارزار، زاڵە، زایەڵە، (باک.) ئەنین. ـــ کردن: زارین، زایەڵەکردن.

**دادێ** (باک.): دایە (زاراوەی دێ یانە)، لەکاتی بانگ کردنی دایکدا بەکاردەبرێ. دێدە (بە ڕێزەوە بۆ خوشکی گەورە بەکاردەبرێ).

**دادی** (ئەردە.): دایەن، تایەن.

**دادێران** (ئەردە.): داهێشتن، بەرەلاکردن، شۆڕکردنەوە، خاو و شل کردنەوە.

**دادیلە:** لەکاتی ئاخەفتنیدا بۆ خۆشەویستی بۆ کچی لە خۆ گچکەتر بەکاردەبرێ.

**دار:** درەخت، داری سەوز و سێبەردار، سا بەردار بێ یا بێ بەر، داری بەمێوە و سەوز بێ یا هیشک و براو. لەشی دار و لق و پۆپە بە پێوە یا بە براوی و بە تەری یا بە ووشکی بۆ دارەڕای سەربانان یا کۆڵەکە یان بۆ سووتاندنی و ئیتر بەکار دەبرێ. پێوانەیێکە وەکوو ڕبە خووێ و چتی تری پێ دەپێورێ. بەدووای هەرناوێکەوە بنووسێ خاوەندێتی نیشاندەدا وەکوو: تاجدار، باجدار، کلیل دار، پەڕاویدار. دەستەڵات، تووانایی، هێز، فەرمان، دارا واتە خاوەند دەستەڵات. پارێزگار، دژدار: پارێزەری قەلات. سێدارە.

**دارا:** دەوڵەمەند، دەستدرێژ، بەتفاق، بەپێچەوانەی دەستکورت و نەدارە. ـــ بوون: دەوڵەمەندبوون، هەڵگران. نێوی دەرمانێکی تیژە لەگەڵ دەرمانی چاوانی بەکاردێنرێ. نێوی پادشایەکی کوردبووە لە کەیانیان. (باک.) نێوی شارێکی کۆنی کوردانە کەوتۆتە نێوانی ماردین و نوسەیبینێ لە ژووررووی شاری (عامودێ) یە، چیرۆکی ڕەشۆی داری لە و گوندەی دەرکەوتووە.

**دارابەڕوویێ** (باک.): دارەبەڕوو.

**دارابەنیشتۆکێ** (باک.): دارەقەزوان.

**دارابەهیڤ** (باک.): دارەبادام.

**دارابەهیڤ تالکی** (باک.): دارەبادامی تاڵ.

**دارابەهیڤێ** (باک.): دارەبادام.

**دارابنابێ** (باک.): دارەبی.

**دارابندەقێ** (باک.): دارەفندق.

**دارابهۆکێ** (باک.): دارەبێ، دارەبەهێ.

**داراتوویێ** (باک.): دارەتوو.

**داراچلۆ:** دارەچڵوو.

**داراخۆخێ** (باک.): دارەخۆخ.

**داراخورمێ** (باک.): دارەخورما.

**دارارەش** (باک.): داری نارەوەن.

**دارازەیتوونێ** (باک.): دارەزەیتوون.

**داراسێڤێ** (باد.): دارەسێو.

**داراشکۆکێ** (باک.): دارەهەرمێ کێوی.

**داراشکێنە:** دارکونکەرە (باڵندە).

**داراقەزوانێ** (باک.): دارەقەزوان.

**داراقۆزێ** (باک.): دارەگووێز.

**داراکارچکێ** (باک.): داری جوورە هەرمێیەکییە.

**داراکەفۆتێ** (باک.): دارەکەوت، دارەکەوێت.

**داراکەنێرێ** (باک.): دارەکەنێر.

**داراکۆلک** (باک.): کۆلکەدار.

**داراگولشیلاڤێ** (باک): دارەگوڵی کێوی.

**داراگولێ** (باک.): دارەگوڵ.

**داراگوویزێ** (باک.): دارەگوێز.

**دارامازی** (باک.): دارەمازوو.

**دارانەوە:** بووردنەوە، بەلادا هاتن؛ ڕۆستەم لە پڕرا دارایەوە.

**داراهەژیرێ** (باک.): دارەهەنجیر.

**داراهرمێ** (باک.): دارەهەرمێ.

**داراهناری** (باک.): دارەهەنار.

**داراهولوویێ** (باک.): دارەهوڵوو.

**داراووس:** بای داراووس، بایەکە تۆو و مایەی دارانی نێر دەگەیەنێتە دارانی مێ.

**داران** (باک.): گەزتن، پێوەدانی دووپشک، داخستن.

**دارای** (هەورا.): دێران، ئاوداشتن، ئاودانی بیستان و باخ و باخچان.

**دارایی:** دەوڵەمەندی، هەبوون، (باک.) بۆچک، بوون، دەستدرێژی، (دەر.) هەبین، دەستەڵات و دەستڕۆیشتن. بەپێچەوانەی هەژاری و دەستکورتی. جوورە پەشتەماڵێکە. دەرمانێکی تیژە بۆ چاو پێی دەڵێن دارا.

**دارباز:** تەنافبار، پەهلەوان.*

**دارە** (ئەردە.): بەستی و خاوی ڕاوەستان.

**دارەبادام:** دارەوام، (هەورا.) درەخت ووامێ.

**دارەبازە:** تابووت.

**دارەباسقەنە:** دارباسقەندە، جوورە دارێکە دارجگەرە و داردەستی لێ دروستدەکرێ.

**دارەبەڕوو:** نەڕە.

**دارەبەجینگوڵ** (موک.): دارێکە لە گۆڕستانانداپەڕۆ و پاڵاتانی پێدا دەکەن.

**دارەبەس:** تابووت.

**دارەبەست** (کۆ.): تابووت.

**دارەبەش** (کۆ.): دابەش، (هەورا.) بەشکەردەی.

**دارەبەشی:** دابەشی.

**دارەبەن:** دارەقەزوان، بنێشتیش دێنی و قەزوانیش دێنێ، (هەورا.) دارەوەنی، بەن، (باک.) بەنیشتۆک. بەنگ، (باک.) دارا بەنیشتۆکێ، درەختێکی بۆن خۆشە و قەزوانی دێنێ و بنێشتە تاڵیش دەردەدا لە شیرەکەی داری قەزوانی، قەدی دارەکە بریندار بکرێ بنێشتی دەردەکات.

**دارەبێ:** (باک.) دارابهۆکێ، داربەی، دارەبەی.

**دارەبی:** دارابنابێ، دارەبی چووار جوورە: دارەبی. شەنگەبی (شۆڕەبی). ڕەشەبی. زەردەبی (بی زەر). ـــ ووشک: چکەبی.

**دارەپەلک:** سوورەچنار.

**دارەت:** چۆنێتی و بار، خۆت لەو (دارەت)ی مەدە، واتە خۆت وا پێشان مەدە، ئەم ووشە هەر بۆ نەبوون و نەهێشتن بەکاردەبرێ.

**دارەتەرم:** تابووت، دارتەرم.

**دارەتوو:** داراتووێ، دارتووی، (هەورا.) داروتفێ.

**دارەخۆخ:** (کە.) دارقۆخ، (باک.) داراخۆخێ.

**دارەخورما:** داراخورمێ.

**دارەدار:** دارەدارە، پێ هەڵگرتنی منداڵانە.

**دارەدارە:** (ڕەوا. ، خۆ. ) پێوەرە، بەتێ بەتێ، (کۆ. ) پەتێ پەتێ، پێ هەڵگرتنی منداڵان، هەستانە سەر پێی منداڵانە لە پێش پێ هەڵگرتنیدا، منداڵێکی کە تازە خەریکی پێهەڵگرتن بێ باوەشی بۆ دەکەنەوە و پێی دەڵێن، دارەدارە منداڵەکەش کەمکەمە هەوڵدەدا کە پێهەڵگرێ و خۆی باوێتە باوەشی وانەوە. ـــ کردن: داردارکردن: هەستانە سەرپێ و پێهەڵگرتنی منداڵانە.

**دارەڕا:** (کۆ. ) دارەڕێ، ئەودارانەیە، کە بە سەرخانووانددا ڕایەڵ دەکرێ و دووا قامیش و بەرچیخیان لەسەر دادەنرێ و دادەپۆشرێ.

**دارەڕەش:** داری (بناو) ە دۆشاوی گەڵایەکانی بۆ مارانگەزتە و برینان زۆر بەسوودە.

**دارەڕێ:** داپۆشینی سەری خانوو بەکاریتە.

**دارەسەوڵە:** داری سەوڵە لێدانێ لەناو کەڵەک و لۆتکەیدا.

**دارەسمە** (ئەردە. ): دارکونکەرە، دارتەقێنە.

**دارەسنجوو:** (خۆ. ) لاس.

**دارەسێو:** داراسێڤێ.

**دارەشتن:** کل و چتی تر لە چاوکێشان، ڕشتن.

**دارەشکێنە:** دەرمانێکی سەوزی تیژی سووتێنەرە، بەهەندێک برینی پیسدا دەکرێ.

**دارەفندق:** دارا بندەقێ.

**دارەقەیسی:** دارە زەردەڵوو.

**دارەکردن:** برێتییە لە گزرە خستنی دار بۆ سووتاندن.

**دارەکەوە:** دارتەقێنە، (هەورا. ) دارکونکەرە، دارەسمە (باڵندە).

**دارەکەوت:** دارەکەرێت، داراکەڤۆتێ.

**دارەگەز:** دارگەز.

**دارەگەڵ:** درەختێکی گەورەیە کە لەلای سەرەوە دوو ناوپەلی قووڵی ببێ گەڵای داربەڕووی تێدا هەڵچنرێ بۆ ئاژاڵان بۆ تفاقی زستانانیان.

**دارەگوڵ:** داراگوڵێ.

**دارەگوڵی کێوی:** داراگوڵ شیلاڤێ.

**دارەگوێز:** داراقوزێ، (کە. ) دارگوێز، (دەر. ) دارگردەکان، (کۆ. ) دارگووز.

**دارەمازوو:** دارەمازی، (باک. ) دارامازی. ـــ حەوت بەران دێنێ: مازوو. بەڕوو، (هەورا. ) بەلوو. سێچکە. گەڵووان. قەزوان. بنێشت. سێچکە، ماچیچکە. کاکە مازی، گلێرە، پۆزە خووگە کە وەکوو لموزی بەرازی وایە.

**دارەمەرانە:** دارێکی ناوبیە بەری وەکوو تاڵە و خۆژەیە. ـــ ڕاست هەڵدەچێ و زۆر بڵند دەبێ.

**دارەمەیت:** دارتەرم.

**دارەمووروتک:** دارمورتک، گەڵاکانی بۆنخۆشە.

**دارەوا** (هەورا. ): درەخت و وامێ، دارەبادام.

**دارەناردەوان:** دارەنارەوەن، (باک. ) داراڕەش.

**دارەوان:** کەسێکە بەدار و درەخت هەڵگەڕاندنێدا چالاک بێ، (خۆ. ، هەر. ) دارە وورز.

**دارەوانی:** (خۆ. ، هەر. ) دارەوورزی.

**دارەوەن** (هەورا. ): دارەبەن، دارێکی تۆپی چڕی گەلاووردی خڕە قۆزاخەیێکی دەگرێ و ناوەکەی پڕە لە مێشوولە. ـــ ی(هەورا) : دارەبەن.

**دارەوکەر:** دارکەر، چیلکە خڕکەرەوە.

**دارەوورز** (خۆ. ، هەر. ): دارەوان.

**دارەهەرمێ:** داراهرمێ.

**دارەهەرمێ کێویلە:** دارا شکۆکێ، قارچ.

**دارەهەلووک:** دارێکە پێی لە هەلووکێ دەدرێ، لە گەمەی هەلووکێنێدا.

**دارەهەنار:** (باک. ) داراهنارێ.

**دارەهەنجیر:** (باک. ) دارا هژێرێ.

**دارەهوڵوو:** (باک. ) داراهوولووێ.

**داربار** (ئەردە. ): دارەوان.

**درباس** (باک. ): تابووت، (باک. ) داربەستی.

**داربەسقەنە:** دارەباسقەنە، جوورە دارێکە وەکوو هەی بەلاڵووکییە، تیکوڵەکەی جووانە، دارجگەرە و دارەدەستیشی لێ دروستدەکرێ.

**داربەڕوو:** (هەورا. )داربەلوو.

**داربەس:** داربەست، چێوبەس.

**داربەست** (باک. ، کۆ. ): تابووت. چەند دارێکە لێک دەدرێن لەشووێنی بەرزدا وەستا کاری لەسەردەکا. قایەی مێوان. ـــ ی(باک. ): تابووت، (باک. ) دارووبەست.

**داربەلاڵووک:** (مەهـ. ) دارەئاڵووباڵوو.

**داربەند:** داربەست.

**داربەندەخووێن:** داردۆخین، دارێکی باریک و لووس و کورتەڵەیە دۆخینی پێ لە دەرپێ و پانتۆڵ و ڕانک هەڵدەکێشرێ.

**داربەی:** دارەبێ.

**داربڕ**(زا. ): گیانداریکی گچکە و دڕندەیە. دارکەر.

**داربلچ** (ئەردە. ): دارەگێووژ.

**داربۆق** (باک. ): مریشک.

**داربۆکردن:** مەبەس لە تۆڵە ئەستاندنەوەیە لە کەسێک، کورد دارێکی بۆ دوژمنەکەی خۆی کرد، واتە تۆڵەی خۆی بەتەواوی لێ ئەستاندەوە.

**داربیر** (باک. ): دارشکێن.

**داربێژە:** دووداری دووپەلە و ڕاست و چەپە، سەرە دووپەلەکانیان لەسەر زەوی دادەنرێن، سەرەکەی تریان یەکێکیان بستێک بەرە و خووار کونێکی تێدایە سەری ئەوی دیکەیان تێدەخرێ بە جۆرێک، کە سەری هەردووکیان تێپەڕێ، ئەم دارە لە مۆڵگەی ئاژاڵان دادەنرێ بۆ ئەوەی کە شووان لەسەری دانیشێ و سەری ئاژاڵە دۆشەنیەکان بگرێ بۆ دۆشین لە (بێژە)دا.

**دارپاچ** (ئەردە. ): تەوەرداس.

**دارپاشین** (باک. ): تەختە.

**دارپێشکە:** دارێکە لەنێو توورەکاندا مێشوولە (پێشکە) ی زۆر دێنێ.

**دارتاش:** دارتەراش، دارتراش، وەستایەکە لە داروتەختە چتی دروست بکات، خیزارچی، (باک.) هیزارچی. ـــ ی: دارتەراشی، پیشەی دارتاشی.

**دارتاشخانە:** کارگەی دارتاشانە.

**دارتەپان:** تەپەی جۆلایی.

**دارتەراش:** دارتاش. ـــ ی: دارتاشی.

**دارتەرم:** تابووت، چوواردارە.

**دارتەقێنە:** (ئەردە.) باڵندەیەکە، دارکونکەرە، دارەسمە.

**دارتەل:** کۆڵەگەیەکی دار یا ئاسنە کە تەلی کارەبا یا تەلەفۆن و بروسکەی پێدا رادەنگێورێ.

**دارتەندوور** (دزە.، بابا.): کۆڵۆوەژ.

**دارترش:** (کە.) دارتوورش.

**دارتوو:** دارەتوو. (ئەردە.) خڵتەی مەی. ـــ یی (هەورا.): دارەتوو

**دارجخارە:** دارجغارە، مۆدنە.

**دارجگەرە:** دارجغارە، مۆدنە، دارێکی باریکی کەمێک درێژە و کونی تێکراوە جغارەی پێ دەکێشرێ.

دارجگەرە

**دارجۆخین:** دارێکە لەنێو جۆخینێیدا دەچەقێنن لەکاتی گێرەدا گای بنەی پێ دەبەسترێتەوە.

**دارجووت** (دزە.): (ڕۆژ.) گاران، دارێکە سەرێکی نەقیزە و سەرێکیشی مەساسەی پێوەیە.

**دارجیگەرە:** دارجغارە، مۆدنە.

**دارچەقەنە:** سەرێکی لەسەر کەویژەیە سەرەکەی تری لەسەر دیوارە، چەقەنە سەرێکی بەنێوەڕاستی دارچەقەنەکەوە بەستراوە و سەرەکەی تریش پشۆر بۆتەوە سەر بەرداشەکە.

**دارچەنگاڵ** (هەو.): (هەو.) ئاڵقەمدوەپشکە، مرازێکە لەنێو کەرستەی جەنجەڕی دایە.

**دارچنار:** دارەچنار.

**دارچین:** دارچینی، دارێکە سوورکارە بۆنی خۆش و تامی تیژە. ـــ ی: دارچینی، تێکوڵە دارێکی سوورکاری بۆنخۆشی گەرمیانییە بەچا لێ دەنرێ و بەچاییەوە لەگەڵ بەهاراتانیش بەکاردەبرێ.

**دارخەزنە:** گەلە.

**دارخڕ** (ڕۆژ.): پێوانی دەغڵە، کە داری بەسەردا بهێنرێ.

**دارخورما:** دارەخورما.

دارخورما

**داردار** (باک.): گچکەی وی (داردارۆک)ە، لە شاخێدا مێووژی بە لکەکانییەوە دەکەن لەهەموو جوورە مێووژێکی تا خەڵک بزانێ، کە چەند جوورە مێووژ هەیە.

**داردان:** باخڵە، توومەدانە. ئەنباری دار. خنکاندن، لەداردان

**داردیی** (باک.): پڕکردن، تەرازکردن.

**داردەست:** چەمک، (باک.) دارک، ڕۆتک، دەستەدار، گاران، سەربست، سقک، شەربات، دارێکی ڕاست و باریک و لووسە بە دەستەوە دەگیرێ، گۆچان (جێگادەستی چەماوەتەوە). بەردەست، نۆکەر.

**داردەلامە** (ڕەوا.): گەمەیێکی منداڵانەیە جووتە گوریسێکە لە لکی دارێکی دەخەن و دارێکی درێژیش دەخەنە نێوقەفی گوریسەکانەوە، کە بەرانبەری یەکتری ڕابوەستن و منداڵان سوواری دەبن، (جا.) داردیلەکانێ، (هەورا.) دیلەکانێ.

**داردۆخووین** (باک.): داردۆخین.

**داردۆخین:** (باک.) داردۆخووین.

**داردۆزەنگ:** (ڕۆژ.) ناوتێرک، (هەورا.) نێرەژەن، ناوێرک، ناودژک، ناومێری، نێوی داری مەشکەیە.

**داردیدار:** دارێکە وەهی مازووی دەچێ و هەمیشە شینە.

**داردیلەکانێ:** داردەلامە.

**دارڕزان:** دافەتان، داوەشان، داقنان، ڕزان، دارڕزینی چت، بۆگەن و گەندبوون.

**دارڕزاندن:** دافەتاندن، داوەشاندن، داقناندن، بۆگەن و گەندکردن.

**دارڕزانن:** دارڕزاندن، دافرەقاندن.

**دارڕزاو:** دافەتاو، داوەشاو، ڕزیو، داقناو. چتی ڕزاوی داوەشاوە.

**دارزەیتوون:** دارەزەیتوون.

**دارزریشک** (ڕۆژ.): دارێکی گەورەیە وەکوو دارەزەیتوونی وایە.

**دارڕزیاگ:** دارڕزاو، هەلاهەلابوو، دافرەقیاگ، پرتووگیاگ، چەک.

**دارڕزیان:** دارڕزان، دافرەقیان. داڕووخان.

**دارڕزێن:** دارڕزێنەر.

**دارڕزێنەر:** داوەشێنەر، دارڕزێن، دافەتێن، دافەتێنەر.

**دارڕزین:** دارڕزان، دافەتان، تووک هەڵوەران.

**دارڕژان:** ڕژان، ـــ ی باڵندان بۆ سەرتەپکە و تەڵە یا بۆسەر کەلاک: واتە بە دەستە گەڵەکۆمە لەسەر کردن، ـــ ی گوللە: گوللەبارانە، ـــ ی مۆر: لە قالب ڕێژران، ـــ ی ئەستێرە: ڕاکشان، ـــ ی بارانە: هاتنەخووارەوەی بارانە بەلێژنە و لێزمە.

**دارڕژاندن:** دارژاندن، ڕژاندن، دارێژاندن، دارشتنی هەندێ چت لە قالبدا.

**دارڕژانن:** دارڕژاندن.

**دارڕژاو:** ڕژاو، دارێژراو.

**دارڕژتن:** دارێژتن، دارشتن، (باد.) دارێتن.

**دارڕمێر:** ژماردنی هێندێ چت بەدار وەک ئاژاڵ و خشتی هەرەکراو و ئیتر.

**دارڕژیان:** دارڕژان.

**دارسان** (هەورا.): دارستان، مێشە.

**دارپسان:** پژین، (هەورا.) فشین، دارپسکان، ڕاسان، فشیای، فەلتین، (زەن.) دابوون. پەلاماردان، هورووژم بردن.

**دارپساندن:** دارپسکاندن.

**دارپساو:** پەلاماردەر، دارپسکاو، ڕاساو.

**دارسموڵە:** بێڵێکە لە لۆتکەدا سموڵە بەو لێدەدرێ.

**دارستان:** (هەورا.) دارسان، جەنگەڵ، لێڕ، لێڕەوار، نزار، چڕە، بێشەلان، شوێنێکە، کە درەختی زۆری تێدا بێ، سا بەردار بێ یا بێ بەر.

**دارپسکان:** دارپسان.

**دارسکاندن:** ڕاپسکاندن.

**دارسمە** (موک.، دەر.)، دارکوورە، (کۆ.) دارکونێرە، (هەورا.) دارەکەوە، (کۆ.) دارکولێرە، دارکلۆرە. پەرەوورێکە لە چۆلەکەی چکۆلەترە، داران دەکۆلێ و کرمیان تێدا دەبینێتەوە و دەیخوا.

**دارسۆرک** (کۆ.): دارەبەروویەکە بە هەرمێ پەیوەند بکرێ، هەرمێکەش و دارەکەشی سوورن.

دارشق

**دارشەق:** قاشۆ. دووداری شەلان وە بن باخەڵیان دەدەن بۆ ڕۆیشتن.

**دارشەقێن:** قاشۆ، دارێکی تایبەتییە گەمەی شەقێنی پێدەکرێ.

**دارشتە:** چتی دارێژراو.

**دارشتن:** داڕژتن، تواندنەوەی چتێک لەناو قالب داڕژتن، داڕژاندن.

دارشەقێن

**دارشکێن:** داربڕ، داربیر.

**دارشکێنە:** مەرگەمووش، دەرمانێکە دەکرێتە ناو هەویر دەرخواردی مشکی دەدرێ بۆ کوژتنی جا مشکی ماڵێ بێ یا هی ناو کشتوکاڵ.

**دارفرسەخ:** نیشانەی ماوەی ڕێگا.

**دارفرۆش:** کەسێکە پیشەی وی تەنها دار فرۆشتن بێ.

**دارڤان** (بالە.): دارەوان. دارکەر.

**دارقەپان:** دارێکی گردی لووسە دووکەس دەیخەنە سەرشانیان و چتی پێ لەقەپان دەدەن وەکوو تایە تووتن و دانەوێڵە و ئیتر.

**دارقەزوان:** دارەبەن.

**دارقەسپ:** دارەخورما.

**دارقەنە** (دارقەننە.): دارێکی درێژی کونکراوە لە کونی قەنەی دەخرێ، کە جوورە سەبیلەیەکە.

**دارقەنەدە:** دارقەننە.

**دارقەوام** (زا.): چتێکە داری خوواری پێ ڕاست دەکرێتەوە.

**دارقووارخ** (ئەردە.): سێدارە.

**دارک:** دەمار، لاسک و دەماری ووشک بووەوەی تووتنی ڕەشۆکی و خوردە لەپاش بژارکردنی. ـــ ی تری: قونچکەکانی ترێیە. ـــ ی تووتن: دەمارەکانێتی. (باک.) داردەست، مودنە، داری گچکە، داری زاوای.

**دارکاری:** (هەورا.) چێوکاری، بەداری لێدان. لێدانی گیاندار بەدار یەک لەسەر یەک. ـــ کردن: بەداری لە کەسێکی یا گیان لەبەرێکی دان.

**دارکەپێچان:** ووتەیەکە مەردومی زۆر لەڕ و لاوازی پێ دەچووێنرێ؛ کابرا دەڵێی ـــ ە، واتە وەک دارێکی ڕەق وایە، کە پەڕۆی پێوە پێچرابێ.

**دارکەر:** (باک.) ئێزنگڤان، کەسێکە، کەداری بە زۆری بڕێ بۆ سووتاندنی.

**دارکەری** (باک.): ئێزنگڤانی.

**دارکەزۆک** (باک.): (باد.، زا.) کێرات، کێرۆکە.

**دارکەڵەمە:** دارکلاوە، کەڵەوە.

**دارکبژێر:** کەسێکە دارک لە تووتن جووێ بکاتەوە.

**دارکردن:** دارکرن، دارکۆکردنەوە، بڕینی دار بۆ سووتاندنێ.

**دارکلاوە:** (موک.، کۆ.، مامە.) کەڵەوە، دارکەڵەمە.

**دارکلۆرە** (کۆ.): دارکونکەرە، دارسمە.

**دارکنێر:** دارەکونێر، دارێکە بەقەد قەیسییە لە شووێنی تەڕو زیخماڵدا پێدەگات پشتی گەڵایەکانی بەسپی دەنووێنێ، پەلکی لە هی چناری گچکەترە، لەهەر جێگایەکی بێ مار نزیکی ناکەوێت. دارەکەی بۆ گۆچان دەستەدات دارێکی بۆنخۆشی کووێستانییە وە داری چووالە دەچێ.

**دارکنێرە** (هەورا.): قڵف، قوڵف، قوڵفەی دارینە لە هەگبە و تێڕ و ئیتر دەخرێت.

**دارکوتک** (هەورا.): کوتکی جل شووشتنێیە.

**دارکوتکە** (شار.): کێووک، دارکۆرینە.

**دارکورە:** دارکونکەرە، دارسمە.

**دارکوولک** (ئەردە.): ژێر جلیت.

**دارکولێرە:** دارسمە، دارەسمە.

**دارکونکەرە:** دارتەقێنە، دانکولە، (ڕەوا.) دارکونێرە، (کۆ.) دارکولێرە. دارکوتک، داری کوتک، خەنجەردەم، باڵندەیەکی دندووک درێژی سەرسوورە بەرسنگی زەردە و سەرباڵی زەردوسپییە بەقەد ڕیشۆڵەیەکییە بە دندووکی داری دەکۆڵێ بۆ هێلانە.

**دارکونێرە** (ڕەوا.): دارسمە، دارکونکەرە.

**دارکێش** (سۆر.): کەسێکە بارەداران لە چیایەوە دەکێشێتەوە ئاوایی یان لە ناو ئاواییەوە داران دەکێشێ، دارەکێشەوە. (بار.) تاکەدارێکە گیشە گیاو چرۆی لەشووێنانی بڵندەوە بەسەر بەفرێدا پێڕادەکێشن.

**دارگەز:** دارێکی باریکی جیرە وە داری سەرو دەچێ، لە قەراخ ئاوان شین دەبێ، گەڵایەکانی ڕیشاڵ ڕیشاڵە بەتەڕیش دەسووتێ لەکەکانی وەگەزی پێوانێ دەچێ، کەبسووتێ کەفی دەردەکات بۆ بیرۆ زۆر باشە.

**دارگورد** (دزە.): پارچەیێکە لە کەرەستەی جووتی، (هەو.) مرازێکە لە کەرەستەی تەونی.

**دارگوڵ:** دارێکە وە بناوی دەچێ، گوڵێکی سپی دەگرێ، چتێکیشە لە وێنەی پنجی گوڵەباخ لە دار و کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ دروستدەکرێ.

**دارگولی** (باک.): باخەوان.

**دارگوێز:** دارەگوێز.

**دارلۆق** (باک.): وەکاز، شەق، گۆچان.

**دارم:** ڕنینی باخ و بێستان.

**دارمازوو:** دارەمازوو، دارمازی.

**دارماڵ:** دار بەسەردا ماڵین، کیلە یا دەفرێکە دووای پڕکردنی لە دانەوێڵە و دارێکی بەسەردا دەهێنرێ تا تەرازبێ. ـــ کردن: لێوان لێوکردنی ئامانێک لە چتی ووشک (قەڵاپەچن نەبی تەرازبێ).

**دارمان:** ڕووخان، کاوول و کەمباغ بوون، داڕووخان. ئارام و هێدی و هێمن بوون، کفت و کۆداکەوتن.

**دارماندن:** کاوولکردن، وێران و کەمباغکردن. ڕۆتەفتاندن، هێدی و هێمن و ئارام کردن.

**دارمانن:** دارماندن، داڕووخاندن، ڕووخاندن.

**دارمەیی:** تیرەیێکی کوردە لە ئێرانێدا.

**دارمووق** (باک.): تابووت.

**دارمیان**: داڕووخان.

**دارناشتن** (کە.): دارچەقاندن.

**دارنان** (کە.): دارچەقاندن.

**داڕنان**: داڕنران.

**داڕنران**: پرتکین، پرچکین، گوورین، ئاوەڕووت کران.

**داڕنراو**: داڕناو.

**داڕنین**: چنین، داڕووتاندن، ڕنین، گەڵاڕنینەوە و لق و پۆپ لێکردنەوە، ــ ی میوە و گوڵ و دەغلی شین: چنین، لێکردنەوە، ــ ی بەرگ: داکەندن، ڕووتکردنەوە، داتاشینی سوواخی کۆنی دیوار و ئیتر. ــ ی پێستی مریشک: ئاوەڕووتکردن. ــ ی پێست و تووک: کەندن، کەنن، پرتکاندن، پرچکاندن، پەرتاندن. ــ ی مەرەزە: دەست بەگوڵی مەرەزەدا هێنان بۆ لێکردنەوەی چەڵتووک.

**داڕۆچکە**: چتی شۆڕبووەوە. ــ کردن: شۆڕکردنەوەی چتێک لە بڵندییەوە.

**داڕۆخە**: کەلاّنتەر.

**داڕۆغە**: سەرۆکی پاسەوانانە، شانە.

**داڕۆغەخانە**: ناوچەی داڕۆغە، شارەوانی.

**دارروو** (هەورا.): دەرمان. (موک.) دەرمانێکە لە قسڵ و زەرنیق بۆ لێکردنەوەی تووکی بەر و هەمووچتێکی، دەرمانی گەرماوێ، کە لە قسڵ و زەرنیق دروست دەکرێ بۆ بەر خاوێنکردنەوە، (باک.) پەژلاندۆک.

**داروبار**: بڕێتییە لە قەلاّفەت و قەبارەی چت؛ نەریان (داروبار) ێکی بە هێزی هەیە.

**داروبەرد**: بۆ دار و بەردوو و دارو هەلاّشیش بەکاردەبرێ، هەردوبەرد.

**داروبەست** (باک.): تابووت.

**داروپەردوو**: دار و هەلاّشی سەربانان، کە ڕووخابێ، داروبەرد.

**دارۆیی** (باک.): جوورە دارێکە. بۆڕی و لوولەی چکۆڵەیە.

**داڕووتان**: ڕووت بوونی درەخت لەگەلاّو لق و پۆپ، ڕووتانەوەی سەروپێ و چتی تر لە موو.

**داڕووتاندن**: ڕووتاندنەوەی لکی درەخت لەگەلاّیان. ڕووتکردنەوەی یەکێک. ــ ی پەلەوەر: ئاوەڕووتکردنی باڵندانە لە تووک و پەڕ. سەر و پێ و بەر و ئیتر لە مووخاوێنکردنەوەیانە.

**داڕووتانن**: داڕووتاندن.

**داروتفێ** (هەورا.): دارەتوو.

**داڕووجان**: جوورە دانێکە لە نێو چەڵتووکیدا شین دەبێ و بالاّ بەرزە، دەنکی وەک دەنکی (کەردەڕە) و هەرزن وایە. نێوی پیاوانە.

**داڕووخان**: ڕووخان، ڕمان، کەوتنەخووارەوەی سەربان و دیوار و چتی بەرز.

**داڕووخانە**: دەرمانخانە. شوێنێکە لە گەرماوێدا کە ــ ی تێدا دەگیرێ.

**داڕووخاندن**: ڕووخاندن، ڕماندن، ڕماندنی دیوار و کۆسپایی سەر بەرە و خووار، دارماندن، ڕمانن.

**داڕووخاو**: ڕماو، ڕووخاو.

**داڕووخیان**: داڕووخانی دیوار و شوێنانی بڵند، دارمیان، ڕمیان، ڕووخان.

**داردەسە**: داردەستە، دەستەودایەرە.

**داردەستە**: دەست و پێوەند، دەستەی نۆکەران.

**داردەوەن**: جەنگەڵ، لێڕەوار.

**داردووڕ** (هەو.): ئاووردوو، ئاگردوو.

**داڕووشان**: ڕووشان، ڕووکان، ڕیشیان، شەرمخین.

**داڕووشاندن**: ڕووشاندن، ڕووکاندن، شەرمخاندن.

**داڕووشاو**: ڕووشاو، ڕیشالۆ.

**داڕووگەر**: دەرمانساز. ــ ی: دەرمانسازی.

**داڕووگر**: ئەو کەسەیە داڕووی لەبەری خۆی هەڵدەسووێ.

**داڕووگرتن**: هەڵسوونی داڕوو لەبەر، داڕوو لەبەرهەڵسوون.

**داڕووگیر**: پیلە، بەربەرەکانی. دەرمانگر.

**دارووندار**: هەست و نیست، هەس و نیس.

**داروونی**: ناوی گوندێکی کوردستانە.

**داروین** (کە.): دارین.

**دارهەلووک**: دارێکە پێی لە هەلووکێ دەدرێ.

**دارهەنە** (هەورا): پارچە مرازێکە لە کەرەستەی جووتیدا.

**داڕێ** (هەورا.): داس.

**داڕێتن** (باد.): داڕژتن.

**داڕێژ**: داڕێژەر.

**داڕێژان**: داڕژان.

**داڕێژاندن**: داڕژاندن.

**داڕێژەر**: داڕێژ، (باد.) داڕێتکەر.

**داڕێژتن**: داڕژتن.

**داڕێژران**: داڕژان.

**داڕێژراندن**: داڕژاندن.

**داڕێژگە**: قالب.

**داڕێژگەر**: داڕێژەر. ــ ی: داڕێژتن.

**داڕێژی**: داڕشتن.

**دارێشکەستی** (باک.): ژن، ئافرەت.

**داری** (باک.): داری ووشک کۆکەرەوە.

**داریانەوە** (ئەردە.): دارانەوە، داکەوتن، ڕمیان، کەوتن، داکەفتن.

**داری بێخووێ**: داری بێخێ، داری بێخوێیی.

**داری بێخێ**: داری بێخووێ.

**داری بێ خوویێ**: داری بێ خێ: گیایەکە لەچاوی دەکێشرێ، پنجە گیایەکە ئەگەر دارەکەی بە ووشکی وەکوو کلچێوک بەچاوی ئاودار دابکێشرێ چاکی دەکاتەوە و ئاوەکەی ووشک دەکاتەوە، بۆ چاوی گرە کووێریدار زۆر باشە.

**دارترش**: داری ترشی.

**داری دارەڕایە**: دەستەک.

**داری قەلاّشکەری**: ئەو دارەی ڕەژووی لێ دروست دەکرێ.

**داری کوتک** (باک.): دارکونکەرە، دارکوتک (باڵندە).

**داریلانک** (باک.): گوڵێکی جوانی کوێستانییە، کە ئیسترانەی لەسەر بووترێ یا لەسەری بلاوێنرێتەوە گوڵەکەی هەڵدەوەرێ.

**دارین**: لەداری دروستکراو، ئەی داری، داروین، چتێکە لەداری دروستکرابێ.

**دارینه** (سل.): خووانەی نانی، نانەشان. دارین.

**دارینەوە**: دارانەوە.

**دازانین** (ئەردە.): دادان، دەلاندن، دەڵیان.

**دازان**: (کۆ.) داهێزان، شل بوونەوەی هەویر.

**دازدە** (باک.): دووازدە.

**دازدەهیک** (باک): دەرزەن، ١٢ دانە، دووازدەجووت، ١٢ تۆپ و ئیتر.

**دازەندن**: شۆڕکردنەوە.

**دازەنین**: کردنەوە و لەیەکتری هەڵوەشاندنی پارچەی کاتژمێر و تفەنگ و دەمانچە و چتی تر.

**داس**: کەلەندۆ، (زاخ.) داسک، (باک.) داساچلۆ، (ئەردە.) جاخسووک، ئاسنێکی کلک دارینی دەم کەوانەییە دروێنەی پێ دەکرێ. لە ـــ پەڕین: هاتنەدروێنە. لە ـــ بەزین: (موک.، دەر.) لە داس پەڕین، هاتۆتە دروێنە.

**داساچلۆ** (باک.): داس.

**داسەپاندن**: بەزۆر بەسەردا بڕین.

**داسەقالە**: داسی چکۆڵە، داسوکە، (کە.) داسولکە.

**داسەکنان**: ئارامگرتن، دامرکان.

**داسپاردن**: سپاردن، تیرکردن، داموچانن.

**داسپارن** (ئەردە.): ڕاسپاردن. هاندان.

**داستان**: چیرۆک، چێچەڕۆک، چرچرۆک، ڕێزک، بەسەرهات. قەواتی، سەربردە، کەڤنەشۆپ، خەبرۆشک.

**داسخاڵە**: داسێکە تەنها گیای پێ دەدروێتەوە.

**داسرەفتن** (ئەردە.): سرەوتن، ئارام گرتن.

**داسرەوین** (ئەردە.): داسرەوتن، داسرەفتن.

**داسڕین**: سڕین، دالووشانن، پاکەوکردن.

**داسقاڵە**: داسووکە، داسی چکۆڵە، (کە.) داسولکە، داسوویلک.

**داسک** (باک.): داسووکە. دەزوو، دەزک، فیسارەکەس بووە بە داسک.

**داسکا** (باک.): ئێلێکی کوردی یەزیدییە لە سنجار (ژەنگار) لەناو هەڤیرکاندان.

**داسک گەنم** (ئەردە.): سیخچە، قلچغی گوڵەگەنم.

**داسکێش** (باد.): دروێنەکار.

**داسماڵ**: دەغل یا گیایەکە پڕ لە دڕک و داڵ بێ یا بە ملاولایدا شکابێتەوە و باش دروێنە نەکرێ. ـــ ی دەکەن: واتا بە ناڕێکی دەیدروونەوە، پاک کردنەوەی گیایە بەداس.

**داسماڵە**: داسێکە لە هەندێک شوێنان بۆ گیا دروون بەکاردێنرێ.

**داسنا** (باک.): ناوی خێڵێکی کوردی یەزیدییە، سەر بەخۆیەتێکیان پێکەوە نابوو پایتەختی وان شاری دهۆکێ بووە لەنزیک موسڵ.

**داسنی**: شەیتانپەرست، یەزیدی.

**داسۆک**: داسی گچکە، داسولکە.

**داسوو** (موک.): بژە گوڵەکەنم و ئیتر، (ڕەوا.) داسی، پەری، چقڵ، (هەو.) بژ، بژی، قەڵچغە باریکەکانی گوڵی گەنم و جۆ و ئیترە. (موک.) بژی گوڵەگەنم و هی ترە. لەسەر زمانی ڕەشەووڵاخی گۆڵە گرتوودا چتێکی وەکوو درووی دەردەکات و داسووی پێدەڵێن.

**داسووک** (باک.): داسی چکۆڵەیە بۆ دروونەوەی گیاو درووو ئیتر، داسقالە، داسک، داسولکە، داسووگ، (باک.) داسۆک.

**داسووگ** (باک.): (باک.) داسۆک، داسوویلک.

**داسوولکە** (کە.): داسولک، داسووکە، داسی گچکە.

**داسی** (موک.): داسوو. دەغل و گیایەکە هاتبێتە دروێنە و پێ گەیشتبێ. قلچغ و چقلی گوڵەگەنم و جۆ و ئیدیکەیە، قەڵداس، بژانگ، قانچک. (باک.) گیایی. سیواووک. ماسی بەخێوکردن.

**داش** (باک.): جاش بۆ ئێستر و کەران بەکاردەبرێ. دامە، چەند پارچەیێکە لەسەر تەختەی دامە و شەترنجیان پێدەکرێ یا دامەیان پێدەکرێ. کوورەی ئاووری.

**داشاخە**: ئاشاخە، ئەیاغی میوە و ئیتر.

**داشەهارە**: تاقەداشێکە دەمێنێتەوە بەدەست یەکێک لەیاری کەرەکانی دامەوە و لە ڕاستە دەتوانێ بە هەموو لایەکی بجوولێ.

**داش بەداش**: دانی داشێک بەداشێک لەگەمەدا. مەبەس لەکوتنی چتێکیشە یا کردنیەتی بەرانبەر بەچتێکی تر.

**داشت**: سفتاح، پارێزگاری، مانەوە، هێشتنەوەی ئاژاڵی مێ بینەیە بۆ زگ و زا، وەی کردەوە ماڵات و ئاژاڵی.

**داشتن** (موک.، فە.): ئاودانی شیناوەردی و باخ و باخاتان، ئاودانی شیناوەردی و باخ و باخچە، داشۆرین. (هەورا.) هەبوون. بەلآن بەتەنهایی بەکار نابرێ بەڵکوو (ئاو) ی بەپێشیەوە دەنووسێ: ئاوداشتن.

**داشدار** (موک.): یارمەتی دان.

**داشدیار**: پەروەردەکار، بنەوانی مەردوم لە ماڵێدا، کابانی ماڵێ. ـــ ی: پەروەردەکاری.

**داشک**: جاشک (زاراوەی منداڵانە).

**داشکاندن**: شکاندن، ووردکردن، شکاندنی ئاو بۆ لای زەوی و زار. ئەژماردنی چتێک لەباتی چتێکی تر. لێ کەمکردنەوە: لەم پارەیە ڕۆژانەی خۆتی لێ داشکێنە.

**داشکانن**: داشکاندن. داکووژاندنەوە، داکووژانن، شکاندنەوە، شکاندن. نووشتاندنەوەی کەناری جل و بەرگ. درز گرتن بەدروونەوە و ئیتر. داخستن، بەرەلاکردنی ئاو.

**داشکەلەرم**: قومری، جوورە کۆترێکە سەربالێ شینە و تەوقێکی ڕەشی لە ملیدایە.

**داشکەلەم**: داشکەلەرم.

**داشکیان** (ئەردە.): مووچیانەوە، هەڵەوگریان، داکووژیان، داخریان.

**داشگیر** (موک.): جوورە بێژنگێکە دەغڵی پێدا دەبێژن و کونی لە هی سەردی گەورەترە.

**داشلیقانن**: دافلیقانن، شلیقانن.

**داشلیقیان:** فلیقانەوە، پلیخانەوە.

**داشن** (کە.): باربوو.

**داشۆرانن** (ئەردە.): بێ شەرم کردن، داماڵانن. (ئەردە.) شوشتن.

**داشۆریاگ** (ئەردە.): داماڵیاگ، شۆریاگ، داڵوچیاگ، داڵووسکیاگ، داڵووسکەبوون.

**داشۆریان** (ئەردە.): شۆڕبوونەوەی چتێک بە جۆرێک کەتەکەتەکی بێ.

**داشۆرین:** شۆرینی چتێک بە بەرزییەکەوە سەربەرەوخووار.

**داشێ** (ئەردە.): برای گەورە، کاک، (ئەردە.) ئابرا.

**داشێلان:** شێلانی نەخۆشان، نەخۆش شێلان. ـــ ی شینایی یان: پێ پەست کردن، شێلانی هەویر و قوڕو هەندێ چتی تر بەدەست یا بەپێ.

**داشی دامە:** بەردی دامە.

**داعبا:** زیندەوار، جانەوەر.

**داغ:** داخ، سووتاندنی گوێچکەی ئاژاڵە بۆ ناسینەوەی.

**داغان:** داووشیاگ، پاشیاگ، بەرباد، پەراگەندە.

**داغانکردن:** تاراج و بەرباد کردنی چت، بەیەکادان، پەراگەندەکردن.

**داغدار:** داخدار. ـــ ی: داخداربوون.

**داغداغ:** دێغ دێغ، خیت خیت.

**داغدان** (باک.): داغکردن.

**داغکردن:** داغکرن، (باک.) داغدان.

**دافەتان:** دارزان، داوەشان، (کە.) دافەتیان، ڕزان، داقنان.

**دافەتاندن:** دارزاندن، داقناندن، ڕژاندن.

**دافەتاو:** ڕزاو، دارزاو، داوەشاو، ڕزیو، داقناو.

**دافەتین:** داوەشان.

**دافرەقان:** داوەشان، دارزین، بڵ و گەندبوونی میوەیە بەهۆی کۆنییەوە.

**دافرتاندن:** داخستن، فڕێدان.

**دافرەقاندن:** دارزاندن، داپلۆخاندن.

**دافرەقانن:** دارزانن، ڕزاندن، دافەتاندن.

**دافرەقیان:** داوەشان، دارزان.

**دافرەقین:** داوەشان.

**دافرتان:** دەرپەڕین.

**دافرتاندن:** دەرپەڕاندن.

**دافرتانن:** دەرپەڕاندن.

**دافلیقان:** داشڵیقان، فلیقانەوە.

**دافلیقاندن** (ئەردە.): داشلیقانن، فلیقاندنەوە.

**دافلیقیان** (ئەردە.): داشلیقیان، فلیقانەوە.

**داڤ** (باک.): داو، داڤک. داوی جاڵجاڵووکە، تەونی جاڵجاڵووکە. درگ.

**داڤەت** (زاخ.): داوەت.

**داڤک** (باک.): داو، تەپکەی چکۆڵەیە.

**داق** (شن.): دەلاقە، تاقە، تاقچە.

**داقەڵەشان:** قەڵشان، قەڵەشان، داقڵێشان.

**داقەڵەشاندن:** قەڵەشتن، داقڵێشاندن.

**داقەڵەشتن:** قەڵەشتن.

**داقەڵەشین:** قەڵشین.

**داقەتا** (باک.): هەتا، تاکوو.

**داقرچان:** قرچان، هەڵقرچان.

**داقرچاندن:** هەڵقرچاندن.

**داقرچیان** (ئەردە.): هەڵقرچان.

**داقرمان:** قرمان.

**داقرماندن:** قرماندن.

**داقڵیشان:** قەڵشان، قەڵشین، قڵیشانی چت لەباری درێژیدا.

**داقڵیشاندن:** قەلەشتن، قەڵشاندن، قەلەشتنی چت لەباری درێژیدا.

**داقنان:** دارزان، دافەتان، پەرێشان و کەلاک بوون، سەر کەچەڵێکی زۆر پیس بوون.

**داقناو:** دارزاو، دافەتاو، زۆر پیس و کەچەڵ بوون.

**داقنین:** قنانەوە، فەتووت بیەن، دافەتان، یا خووا داقنێیت: داوەشێی.

**داقنینەوە:** داقنین، دافەتان.

**داقۆق** (باک.): کوتکی دار.

**داقوتان:** داکوتان.

**داقوتاندن:** داکوتاندن.

**داقورتان:** قووتدان، داقورتە: قووتدە.

**داقورتاندن:** پێ قووتدان، داقوورتێنە: پێی قووتدە.

**داک** (باک.): دایک.

**داکسان:** دامرکان، ئارام و هێدی بوون، (کە.) داکەسان.

**داکساندن:** دامرکاندن.

**داکسانن:** دامرکاندن، ئارامکردن.

**داکساو:** دامرکاو.

**داکسیان:** داکاسین، ئارامی گرتن. داکەوتن.

**داکسین:** داکەوتن، ئارامی گرتن.

**داکانە:** دایکی باڵندە و جانەوەرانە، بەرانبەری (باوکانە)یە. وەکوو دایکان. نرخ و مزومافی دایکێتی.

**داکاساندن:** دامرکاندن.

**داکاسانن:** دامرکاندن.

**داکاساو:** دامرکاو.

**داکاڵیان:** کاڵیان.

**داکانە:** دایکانە، دایکێتی. مێ یینە.

**داکەتن** (باک.): داکەوتن، هاتنەخووار، نزم بوون، داکەڤە: داکەوە

**داکەسان:** ئارام و هێدی بوون.

**داکەساندن:** دامرکاندن، ئارام و هێدی کردن.

**داکەساو:** دامرکاو.

**داکەسین:** داسەکنان.

**داکەفتە:** داکەوتوو، خوواربوونەوە.

**داکەفتەگی:** هاماری، داکەوتوویی، چالاّیی.

**داکەفتن** (ئەردە.): داکەوتن، خووارەوکەفتن.

**داکەلاندن** (ڕەوا.): داکەندن.

**داکەمار:** شینشینک، دایکە مارانە.

**داکەمارانە:** شینشینک، دایکەمارانە.

**داکەناندن:** داکەندن. پێداکەندن.

**داکەندن:** لووچکاندن، هلبرن، بەرگ لەبەر خۆ دەرهێنان، داماڵینی کالاّ یا هێندێ خشڵی وەکوو ئەنگوستیلە و گووارە و ئیتر، داکەنین، (ڕەوا.) داکەلاندن، (باک.) شەلاندن، ژخووەدانین، ژخووەکرن، ژبەرڤەکرن، پێداکەندن، داکەناندن.

**داکەنن:** داکەندن، دەرهاووردن.

**داکەنین:** داکەندن.

**داکەواندن:** خستن. ڕوچوواندن، قوّپاندن، تەپق کردن.

**داکەوتن:** ڕۆچوونی بان و زەوی و چتی تر، تەپق بوون، تەپک بوون، قوّپان، هاتنەخووار، نزم بوونەوەی چتێکی بەرز، شۆڕبوونەوە، بەربوونەوە، کەوتنەخووارەوەی چتێک لەبەرزییەوە، نیرکەکە داکەوتووە: واتە نەوی بووە. دابین بوون، ڕۆکەوتن، ڕۆتەفتان، دەست هەڵگرتن و وازهێنان لە کارێک: داکەوە: وازبێنە، دابین بوون بەو بەشەی کە هەیەتی. کەم کردن، پیربوون، بەناوەوەچوونی گیاندارە.

**داکەوتوو:** چتێکە داکەوتبێ.

**داک برا** (هەو.): دایک برا.

**داکتن** (زا.): شۆڕکردنەوەی چت.

**داکداکانێ** (هەو.): جوورە گەمەیێکی منداڵانەیە، قوّرتقوّرتانێ.

**داکردن:** بەتاڵکردن، ڕژاندن. کونکردن، کەلێن تێخستن (دیوار و ئیتر)، بردنە ژوور، میوان داکردن: بردنەژوور. ـــ ی ئاژاڵ و وولاّخان: مەبەس لە بردنیانە بۆ نێو حەوشە و تەویلان. ـــ ی بارانە: بارین. تێخستنی کەسێک لە یاریدا. ـــ ی دەغل و دانەوێڵە: مەبەس لە ئەنبار کردنیانە و ڕۆکردنیانە لە جەواڵ و چتێکی ترەوە بۆ ناو دەفر و ئەنبار و ئیتر. ـــ ی گوێز و مەڕمەڕ و جگ و ئیتر: مەبەس لە دانانیانە لە شوێنێکی پێویست بۆ ئەوەی کەللا و تیریان تێگریت لەگەمەدا.

**داکرمان:** داخرمان، ووردکران و هاڕدرانی چتی ڕەق بە ددان.

**داکرماندن:** داخرماندن، ووردکردن و هاڕینی چتی ڕەق بەددان.

**داکرن** (باک.): پێداکردن، ڕژاندن، دانان.

**داکرۆژ:** ڕێکخستن، کرۆژەر، کەسێکە چتی وەکوو شەکر بەددانی بکرۆژێ.

**داکرۆژتن:** کرۆژتن، داکورۆژتن.

**داکشان:** کشانەخووارەوە، هاتنەخووارەوەی چتێک یا چەند چتێک لەبەرزییەوە بە گورجی. ئەلفێکی کورتە لەژێر تیپێکی عەرەبیدا دەنووسرێ کە (ی) ی بە دەمەوەبێ.

**داکشاندن:** کشاندن.

**داکشاو:** داخزاو. ـــ ی: هاتنەخووارەوە، بەرەوژێربوونەوە.

**داکۆکی** (ئەردە.): پشتیوانداری کۆشش و هەوڵ و تەقەلاّ.

**داکوو** (باک.): تاکوو، تا، هەتاکوو.

**داکوتان:** داقوتان، چەقاندن، کوتانی سینگ و ئیتر لەسەر زەوی و سەربان و تەختە و دیوار و ئیتر، بردنە خووارەوەی سینگ و بزمار و ئیتر بە شوێنێکیدا بەنهێتم. لێدان، کوتان، تێکوتان. تەکاندنی چتی توّزاوی، دامەزران، کەوڵ و پوست بە جێگایەکی دادان. کوتانی گوڵی گەنم و ئیتر لەجیاتی گێرە.

**داکوتاندن** (باک.): دامەزراندن.

**داکووتان:** داکوتان (بۆ سینگ و بزمار و ئیتر). خوسپ کردن، لە پاشملە بەخراپە باسی کەسێکی کردن.

**داکوتیان:** کوتیان، کوتران (بزمار و ئیتر).

**داکوڕهین** (زا.): پۆشین، داپۆشین.

**داکوروۆژتن:** داکورۆشتن.

**داکوروۆژین:** داکورۆژتن.

**داکوروۆشتن:** خوواردن و ووردکردنی چتی ڕەق بەددانی، داکورۆژتن.

**داکووژان:** کووژانەوەی چرا و ئاوور. کۆتایی هاتنی چنینی گۆرە و بەرە و مافوورە و ئیتر.

**داکووژاندن:** کووژاندنەوەی چرا و ئاوور و ئیتر، کۆتایی بە چنینی گۆرەو بەرە و مافوورە و ئیتر هێنان.

**داکووژنن:** داکووژاندن، داشکاندن، وەرگێڕان.

**داکووژیان** (ئەردە.): داکووژان، داشکیان، هەڵەوگریان.

**داکووکی** (ئەردە.): پشتیوانی، دۆستایەتی، لاکوشی، لاکوشکی، یاریکاری، پالووبنی. (ئەردە.) کۆشش، کۆشین، تێکۆشان، تێکۆشین.

**داکووکیان** (ئەردە.): تێکۆشان، کۆشین، تەلاش، هەوڵ.

**داکێشان** (ئەردە.): کێشانە خووارەوە، ڕاکێشانی چتێک لەسەرەوە بۆ خووارەوە، شۆڕکردنەوە، داهێشتن. (ئەردە.) ڕاخستن، پان کردنەوە، پانەوکردن، درێژکێشان.

داگا: نەنک.

**داگەران:** ـــ ی ئاو، گەل، گاران، سەرە و ژێربوونەوەیە بەرە و خووارەوە، هاتنەخووارەوە لە شوێنێکی بەرز، لەش بە ئەسپێ و ... ـــ: واتا لەش تەواو داگرتن.

**داگەڕانەوە:** گەڕانە دوواوە.

**داگەڕاندن** (باک.): ناردنەوە، داگێڕاندن، داگێڕان.

**داگەڕاندن** (باک.): دووبارە ناردنەوە، پەشیمان کردنەوە.

**داگەڕیان** (باک.): گەڕانەوە، ڕەوانەکرانەوە.

**داگر:** داگیرکار، داگیرکەر.

**داگران:** هەڵگران.

**داگرتەک** (باک.): هەڵگر.

**داگرتن:** خووارە و هاووردن، دەست پێکردن، دەست بەلێدانکردن، ـــ بە بەردان، بەردەباران کردن. هێنانەخووار، هانینەخووارێی چتێک لەبەرزییەوە. پەستاوتن، داپەستاوتن، پڕکردن، ـــ ی بار: ئاخنینەوە و

پڕکردنی جەواڵ و چتی تر لـە دان و چتی تر: بارەکەم داگرت. بەچەکان ـــ : گوللـە باران کردن. زۆر بلّێـی، ـــ بەقسـان: واتـا ئـەوەندە چەنـە لێـدان مـەیدانی ئاخۆتنی کەسی نـەدات، درێژە بەقسـەدان و سەرخسـتنـە سـەر. دروون، دوورانــن(لێـواری جلـک و ئیـتر). دەورە ـــ : دەورەگرتــن، دەورەدان، هـەمووﻻگرتن، سـفت کـردن، لێـدان، کوتـان، دەسـت بـە لێدانکردن، دایگرت، زۆری لێدا: فیسارکەسی داگرت: واتـە دەستی بـە لێدانی کرد. پیێ ـــ : پیێ لێ ـــ : هەتـەرکردن، لـەسـەر ڕێیشـتن، میـچ لەسەر گرتن، بنارکردن، داپۆشین و داگیرکردنی چتێک بۆ چتێـک: هـەوور ئاسمانی داگرت، پڕکردن.

**داگرتنـەوە:** ـــ ی فیشـەک: دووبـارە فیشـەک پڕکردنـەوە بـە بـارووت و تەرقە، هەڵپێچانی سەری دوو پارچە بەدروون کە لـە پێشـەوە لەیـەک درابن. ـــ ی کون: ئاخنینەوە، ئاخنینەوە و پەستانەوە و گیرانی سەریان تا توندبێتەوە و دڵۆپەی نەکا، دروونـەوە، دووراندنی کەناری جل و بەرگ و ئیتر.

**داگرتوو:** داگرتی.

**داگرتی:** داگرتوو.

**داگرسیان:** داگیرسان، پێبوون، هەڵکران.

**داگزگزین** (باک.): لـەمستیدا کوشین، بەدەست کوشینی چتێکی.

**داگوشین:** گوشین و دەست هێنان بەچتێکی نەرمدا، سەربەرەوخووار.

**داگهاندن** (باک.): گەیشتن، گەیاندن.

**داگیەبەزێرتلەیا**(ئەردە.): بای تێکردووە، دەستی لـەپشتی داوە، هانی داوە، فیتی داوە.

**داگێران:** سەرە و ژێربردنی ئاو یا ماڵات، داگەڕاندن.

**داگیر** (باک.) ڕاسەر، زەوت. ـــ بوون: زەوت بوون. ـــ کـردن: ئـەگرتن، بەسەردا زاڵ بوون، تێڕژان، زەوتکردن، لەهاندن، دەسـت بەسـەر داگرتـن، دەست بەسەر داکێشان، دەست بەسەر دابڕین، پیێ بەرکرن.

**داگیران:** داگیرانی لـەش: قـورس بوونی جەستە. لـەبڵندییـەوە هێنرانـە خووار. ـــ ی چاو: دەست بـە ئێش کردنی چاو. ـــ ی ئاوور: هـەڵبوون، ئاییسان، داگیرسان. ـــ ی گووێ: گران بوونی گووێ.

**داگیراندن:** داگەڕاندن. (باک.) هەڵنووچاندن، (دزە.) بادانـەوە، جـوورە دروومانێکـە کـەناری یـەک پارچـە خـڕدادرێ و لوولـەدەدرێ و دەدروێ، داگیرساندن.

**داگیرانن:** داگیراندن.

**داگیراو:** هێنراوەخووار. هەڵاییساو، داگیرساو.

**داگیرسـان:** داهێنران و نۆبـەتیێ لیێ هـاتن، ـــ ی لـەش: گـەرم بـوون و ئاییسانی لەش لەبەر ناسازی یا ڕق و قین: لەشم داگیرسـاوە، ـــ ی چاو: دەست بـەئێش کردن، ـــ ئـاوور: گڕدان، گڕسـەندن، هـەڵبوون، ئاییسـان، هەڵاییسان، داگیران، ئاوورگرتن.

**داگیرساندن:** دەست پێکردن. ـــ ی ئاوور: هـەڵکردن، پێکردنی ئـاوور و چراو ئیتر، ڕەوشەنکردن، گەشکردنەوە. ـــ ی شەڕ و کێشە: هەڵاییساندن، هەڵگیرساندن.

**داگیرسانن:** داگیرساندن.

**داگیرساو:** دەست پێکراو. هەڵکراو، ئاییساو.

**داگیرسیان:** داگیرسـان، ڕەوشـەن بـوون، هەڵگیرسـیان، گەشـبوونەوە. سووربوونەوە، داگریان.

**داگیرکەر:** کەسێکە چتێکی زەوتکردبیێ یابکات. دەوڵـەت یا هێزێکی بێگانەیە، کە شووێنێکی داگیرکردبیێ یا زەوت بکات.

**داگیرکەردەی** (هەورا.): داگیرکردن.

**داگیرکراو:** زەوتکـراو، هیسـتۆک، شـووێنێکە دەوڵـەتێکی بێگانـە داگیری کردبیێ.

**داگیرکردن:** زەوتکردن یا بردنی چتێک بە زۆر، دابڕکردن.

**داگریان:** لەش گران بوون. داگیران، داگیرسان.

**دال:** نێوی تیپی(د) یـیە. (باک.) چەماوەوە، داهاتوو.

**داڵ:** هێشـووی جـوورە ترێیـەکی دەنـک شاشـە. (جـا.، بابـا.، مـوک.) داڵاش، باڵندەیەکە بەقـەدەر قازێکییـە دندووکی قولاپـەدارە وەکـوو بـازی زۆر بـەهێزە و گۆشتخۆرە، گۆشتی خۆشی ناخوریێ لـەنێو کێوانـدا دەژیێ، چەنگاڵی تیژ و دندووکی قولاپییە. مرۆی بـیێ تـووک و لاواز بـەڵاڵن زۆرتر لـەگەڵ گۆشت بەکاردەبریێ: داڵگۆشت. دروو. هێشووە ترێی شاش.

**داڵاش** (موک.): باڵندەیەکی بەقەد قازێکییە دندووکی قولاپـەدارە وەکـوو بازی زۆر بەهێزە و گۆشتخۆرە، (بابا.، جا.) داڵ، داڵە کەرخۆرە، خەرتەڵ، (کە.) کەپەنەک داڵ، (ئەردە.) لاشەخۆرە.

**داڵان:** سـیپک، نێودەرکـە، (بـاک.) لیـوان، نـاڤدەر، (کـۆ.) نێڤکـۆ، کەلـەگی، (هـەو.، دەر.)بێلاییی، هـەودان، (کۆ.) بندەرگـە، لـەمژوورەوەی دەرگـای حەوشـە هـەیوانێکی سـەرگیراوە بـەوێدا دەچیـە نێوژوورەکـان و حەوشەوە. جێگایەکی سەرگیراوە بەدەم دەرگای حەوشەوە، ڕاڕەو.

**داڵاندار** (لو.): خانچی. ـــ ی: خانچێتی.

**داڵندووورەپ:** ژنی قووچیی لۆقنی لاواز.

**داڵە** (بار.): باخچەی بەرماڵان.

**داڵەڕۆچکە:** دارۆچکە.

**داڵەسـەی** (بـار.): قەڵەسـابوونی، لــەلای هــەندێکانیش سیسـارکە کەچەڵـەیە.

**داڵەقاندن** (زا.): هەڵاوەسینی چتێک بە چتێکی ترەوە، بەدارەوەکردن.

**داڵەکـەرخۆرە** (بابـا.): داڵاش، بـاڵندەیێکی گۆشتخۆرە و لـە هـەموو باڵندەیێکی زلترە.

**داڵەگەڕگەڕ:** قەرەداخ، سیسارکە کەچەڵە.

**داڵەلووک** (بار.): جوورە مێوێکـە ترێی ڕەش یا زەرد و وورده و کێوییـە لـەکەنار ئاواندا هەڵدەکەویێ، چۆمیلکە، (گەر.) کەرەمێو.

**داڵەواز** (کە.): کەس، زیندەوار، ـــ ی لیێ نەهێشتن: واتـە زیندەواری لیێ نەهێشتن. لەسەر لاق ڕاوەستاو.

**داڵبوون:** برێتییە لە لاواز بوونی گیاندار.

**داڵدە:** پەنا، نەوا، پشتیوان، پەنا، پەناگا، کوڵەکە، بیێ ـــ : بـیێ پـەنا، بیێ نەوا، بیێ ـــ یی: بیێ پەنایی، بیێ نەوایی.

**داڵدەدان:** پەنادان، پشتیوانی کردن.

**داڵدەهێنان:** پەنابردنی یەکێک بۆ کەسێکی تر.

**دالستن:** لستنەوەی چت و گوشاردنی هیزەی ڕۆن.

**دالقاندن** (باک.): تێ ئالْقاندن، هەلاْوەسین.

**دالقین** (باک.): خۆهەلاْوەسین، تێ ئالْقان، دالْقێنە.

**دالْک** (لو.، فە.، رۆژ.، همەە.، گێژ.): دایک.

**دالْکان** (ئەردە.): نووسان، پێوەنووسان، لکانی چتێک بەسەر چتێکی تردا.

**دالْکانە** (لو.، فە.، رۆژ.، همەە.، گێژ.): دایکانە.

**دالْکاندن**: نووساندن، لکاندنی چتێک بەسەر چتێکی تردا، دروون، دووراندن، چەسپاندن.

**دالکانن**: دالکاندن.

**دالْکەدزان** (ئەردە.): دەستەک دز، دزە دەست کیس، دایکە دزانە، دزدەسک.

**دالْکەدزانە**: دایکەدزانە.

**دالْکەمارانە** (رۆژ.): مارمێلکەی گەورە، دایکەمارانە.

**دالْکی** (فە.، لو.، رۆژ.، همەە.، گێژ.): دایکی، دایکێتی.

**دالْکیان** (ئەردە.): دالکان، دووریان، دروان.

**دالْگۆشت**: لەڕ، لاواز، رەقەڵە، بێ تووک، (هەو.) مسری. ـــ ی: لەڕی، لاوازی، بێ تووکی.

**دالنگ** (باک.): سەرمیانی، دەستوور، قانون، نیزام نامە.

**دالنگۆک** (باک.): قانون، نیزام نامەی چکۆلە.

**دالْۆچکە**: چتێکە لەشووێنێکی بەرزەوە داهێلرابێتە خووارەوە.

**دالْووچیان**: دالْووسکیان، دالْووچەبوون، شۆڕبوونەوە.

**دالْۆزکە** (ئەردە.): دالْۆچکە.

**دالْووزان** (ئەردە.): دالووچکە.

**دالْووت** (ئەردە.): دالْیت، چەفتە، چێویەس، داربەس.

**دالْووچانن** (ئەردە.): دارۆچکەکردن، داهێشتن، شۆڕکردنەوە (دۆلچە و ئیتر)، دالْووسکانن، دالْووزاندن.

**دالْووچە** (ئەردە.): دالْۆچکە.

**دالْووچکە** (ئەردە.): دالْۆچکە، خۆشۆڕکردنەوە، هەلْواسین بەچتدا.

**دالْووچیان** (ئەردە.): شۆڕبوونەوەی چتێک لەبەرزییەکەوە.

**دالْووزان** (ئەردە.): دالْۆچکە.

**دالْووزکە** (ئەردە.): دالْۆچکە.

**دالْووسکە** (ئەردە.): دالْووزکە، دالْووچکە.

**دالووشان**: سڕانەوەی (لووت).

**دالووشانن**: فم کردن، لووت پاک کردنەوە.

**دالووشکانن**: دالووشانن، لووشکانن.

**دالْیە** (کە.): زەوێکی تایبەتییە کە شیناوەردی وەکوو تەماتە و بامیە و توور و ئیتری لێ بچێنرێ، (لو.) سیی پێوانە یا سیی ژمارەیە لە چتێک سا دانە ویلّە بێ یا چتێکی تر.

**دالێدان** (کە.): مردنی مەڕە لەبەر زۆرخوواردن.

**دالْێوە**: کەمێ، کەمێک.

**دالْیت** (هەورا.): مێوێکە بخرێتە سەرداران یا سەرقایان و نەبێتە کۆلکە، (کۆ.) پەرچ. کەپر و قایەیێکە بۆ مێو دروستکرابێ، (ئەردە.) دالْووت.

**دالیسان**: دالستن.

**دالیستن**: لێستن، لێستنەوە.

**دالینۆک** (بار.): تریێەکی رەش وووردی کێوییە، (شا.) تریِ ڕێویلە.

**دام**: داو، تەڵە، (باک.) گەمەی دامەیە.

**داما** (فە.): زاوا.

**دامار** (باک.): دەمار، نەژاد، رەگ. (باک.) زرپاب، زرپاڤ. ـــ ی (باک.، بتلیس.) زرکوڕ.

**داماگ** (ئەردە.): داماو، دەرمەنە، پەک کەفتگ، دامەنە، بێچارە. ـــ ی: داماوی.

**دامالاْن**: هاتنەخووار. ـــ ی سەرووپێچ: هەلْوەشان. گەسک دران، مالْران، دامالْران. لێ بوونەوە: پەتەکە لەملی ئێسترەکە دامالاْوە واتە دەرهاتووە. لاواز: فیسارەکەس بەنچە تایێک دامالاْوە.

**دامالْران**: مالْران، گووران. گەسک دران، دارنران.

**دامالْیاگ**: رووداماڵراو، بێ شەرم، بێ ئابروو. دامالاْو، کینیاگەوە، دامالاْوە و لێبوونەوەی پێستی لەش یا دەرپێ و پانتۆڵ و رانک و ئیتر.

**دامالْیان** (ئەردە.): دامالاْن، کنیان، داشۆریان. بێ شەرمی، بێ ئابرووی، رووداماڵراوی.

**دامالْین**: گووروانـدن، دامالْین، مالْین، کەلەزووسک، خەشک کرن. هەلْوەشاندن و هێنانەخووارێ سەر و پێچ. لەبەر ـــ : رووتکردنەوە، داکەندنی چتێک لەچتێک، لابردن و مالْینی چتێک لە چتێک بە دەست؛ قابە چەورە کە دامالْە. دەست پێداهێنان، دەست بەسەردا مالْین.

**دامان**: پەک کەفتن، پەک کەوتن، دەستە ووستان بوون، دەستەووسان بوونی مەردوم و پەک کەوتنی لەسەر چتێک. واق وورمان، دوودڵ بوون. ڕامان، بیرکردنەوە. بەپەرۆش و خەمگین بوون. دەمان (دەر.، هەورا.، کە.): داوێن، دامێن، دانگە (سزیر)، داوێنی مرۆ و چیاو دار و بار و ئیتر. سزا، دەیەک.

**دامان پۆش** (کە.): دەرپێ.

**دامانگر**: داوێنگر، دامانگیر.

**دامانگرتن**: داوێن گرتن.

**دامانگیر**: داوێنگر، داوێنگیر. ـــ ی: داوێنگیری.

**داماو**: کەساس، تێماو، لێ قەوماو، بەدبەخت، هەژار، کز، پەرۆشدار، کەسێکە زۆر دامابێ، ئاتاج، پەک کەوتوو، نێوی پیاوانە، نازناوی یەکەمین مێژوو نووسە بە زمانی کوردی و دامەزرێنەری چاپخانەی کوردستانە ناوی حوسێن حوزنی موکریانییە لە سابلاْخی لەدایک بووە لە ۱۹٤٧/٩/٢٠ دا لە بەغدایە ئینگلیزان بەهۆی دۆکتۆر دوسوودەی پزشکی تایبەتی بالْیۆزخانەی خۆیان دەرماندراویان کرد، بەندەش بەبرایەتی وی سەربلّندم. ـــ ی: ئاتاجی، پێداویستی، بەدبەختی، (باک.) دامایی، دەستەووستانی.

**دامایی** (باک.): داماوی.

**دامە**: داش، (ئەردە.) تووم، گەمەیێکە بە دامەی دەکرێ بە دووکەسان بەسەر تەختەیێکی شێست و چوار خانەیی هەر لایەی بە (١٦) داشان یاریەکەی دەکات.

**دامەدامە:** داشداش.

**دامەدامەیی:** دامەیی.

**دامەرزان** (ئەردە.): دامەزران، دامەرزیان، بەندبوون، ویستان، وێسان، پاوەجێ بوون، دەس وەکاربوون. هێدی و هێمن و ئارام بوون، داکاسانی.

**دامەرزاندن** (باک.): دارژتن، چێ کرن، دانیان، پاوەجێ کردن، دامەرزینە، (ئەردە.) دامەزراندن. (باک.) دەست بەکارکردن.

**دامەرزانن** (ئەردە.): دامەزراندن.

**دامەرزیان** (ئەردە.): دامەزران.

**دامەرزین** (باک.): خۆدارژتن، دارژان.

**دامەزران:** بنەگرتن، جێگرتن، رێک کەوتن، هێورین، (باک.)ئێورین، چێبوون، ڤەگژگرین، چەقان، چەقین، داکوتان، (کە.) دامزران، تاقەتکران، زنج داکوتان، جێ گیربوونی چتێک لەشوێنێک، کارێکە لە جێگەی خۆی پێک بێ.

**دامەزراندن:** داکاساندن، هێدی و هێمن و ئارام کردن. ڤەگژگژاندن، هێوراندن، (کە.) دامزراندن، داکوتاندن، تاقەتکردن، دابین کردن، چەقاندن، زل کرن، جێگیرکردنی چتێک لە شوێنێک، بجێ کرن.

**دامەزرانن:** دامەزراندن.

**دامەزراو:** دابین کراو، (کە.) دامزراو، بنەگرتوو، جێگرتوو، بنگرتی، تاقەتکراو، چتێکە لەشوێنێکیدا جێگیربووبێ، چەقاو، چەقێنراو.

**دامەزراوی:** دامەزرایی.

**دامەزرێنەر:** دابینکار، هێورانەر.

**دامەکە:** خۆ: ئایا، ئاخۆ.

**دامەن:** داوێن، دامێن.

**دامەنە** (کە.): پەک کەوتوو، بێ بەهرە، بێ بەش، بەشبڕاو.

**دامەیی:** دامەدامەیی.

**دامران** (کە.): دامرکان.

**دامراندن** (کە.): دامرکاندن.

**دامردن:** نەمانی گڕی ئاوور، سیس بوونەوە، ووشک بوونەوە.

دامردنەوە: دامردن.

**دامرکان:** لەبزووتن کەوتن، ڕۆتەفتان، داکاسان، داکەسان، داکەوتن، واز لە گریان هێنان، ژێربوونەوە، بێ دەنگ و ئارام بوون، سارێژبوونی برین و ئێش، دامران. کووژانەوەی ئاوور یا ئاگری گێچەلاٚن.

**دامرکاندن:** واز لەگریان پێ هێنان، داکاساندن، ژێرکردنەوە، داکەساندن، دامراندن، لەبزووتن و جوولەخستنی چتێک، کووژاندنەوەی چراو ئاوور، سارێژکردنی برین و ئێش و ژانی لەش.

**دامرکانن:** دامرکاندن.

**دامرکاو:** داکەساو، داکاساو، ژێر.

**دامرکیان:** دامرکان، داکاسیان، ئارام بوون.

**دامرکێن:** دامرکێنەر.

**داملاٚن:** داماڵاٚن.

**داملاٚندن** (ڕۆژ.): داماڵین، هەڵوەشاندن.

**داملاٚو:** کردنەوەی سەرووپێچ یا تەنگەی وولاٚخان، داماڵاٚو.

**داملەچەقان:** دامنە چەقان، (سەق.) بەرکەڵ سا نێر بێ یا مێ، نیوونی بەرکەڵ.

**دامنەوکۆیی** (هەورا.): داوینی کێو.

**دامنە** (هەورا.): پاشڵ، داوێن.

**دامنەچەقان:** بڕوانە: داملەچەقان.

**دامۆچاندن:** داموچاندن.

**دامۆچانن** (ئەردە.): تیژکردن و هانەهانەدان، داموچانن، داسپاردن، هەڵ خڕانن، وادارکردن. داشکاندن.

**دامۆچیاگ** (ئەردە.): کەسێکە، کە تیژکرابێ و هانەهانەدرابێ، تیرکریاگ، داموچیاگ، داسپێریاگ.

**دامۆچیان** (ئەردە.): هاندران، فێرکردنی چارەوێیە بۆ سوواری و فێرکردنی وولاٚخە بۆ بار و جووت.

**دامۆران** (ڕۆژ.): خەریک بوونی مەڕ و مێگەل، بەلەوەڕ.

**داموس:** داموسک، مووی یاڵ و کلکی چارەوێیە، تامووسک.

**داموسک:** (کۆ.) داومسکە، مووی کلکی وولاٚخی بەرزەیە دەیکەنە داوی تەپکە و ئیتر بۆ ڕاوە باڵندان، مووسک.

**داموسکان:** پێوەبوون، خۆپێوەهەلاٚوەسین.

**دامێن:** داوێن، دامەن، شاقەلی کەوای درێژ و کراسی ژنان و چمکی هەر چتێکی بێ.

**دامێنگر:** داوێنگر، دامانگر.

**دامێنگرتن:** داوێنگرتن، هەنابردنە بەرکەسێک.

**دامێنگیر:** کەسێکە داوای پەناو هەناو یارمەتی بکات لەکەسێکی تر. ــ ی: داوێن گرتن.

**دان:** دانی دەخڵ و دانەوێڵە، دەنک، تەڵ، دانە، قل، تووم. ئەودەنکە دەخلاٚنەیە بە باڵندان و ماڵاٚتان دەدرێت. پێدان، بەخشین، بەخشش، بەخشینی چتێک بە یەکێک، نان دان بەهەژاران، بدە. گاندان. بۆ شوێن و دەفرە بەلاٚن بەدووای ناوانەوە دەنووسێ: خووێدان، قەندان، گوڵدان، ئاگردان، قەڵەمدان. چین، چەل، جار، هەل، چاخ، کات، گاڤ، دوودان: دووچین، ــ ی بەیانی بەشێکە لەڕۆژێ لەبەیانییەوە تا نیوەڕۆیە، ــ ی ئێواریێ: بەشێکە لەڕۆژێ لەنیوەڕۆیەوە تا ئێواریێ، ــ ی ئالینجێ: کاتێکە لە (٨) ی بەیانییەوە تا (٤) ی ئێواریێ. (بابا.) ددان، دران، دوو ڕیزە ئێسکەکانی دانەدانەیە کە لەسەر پووکی گیاندار دەڕوێ و خواردەمەنی پێ وورد دەکرێ و ٣٢ دانەیە. لێدان: من کێر لدەستێ خووەدا، بارام لمن داکوتان. فەرمان، ئەنجامدان، ــ زانین، دان ناسکرن: بەناسین دان. گرتن: من ئەو دان بەرخۆ: من ئەوانم گرتە پێش خۆ. ــ بەرگیرا (باک.) هاوار و بانگ کردن. بەناسین دان. (باک.، باد.) ژەم، جەم. ــ بەری چێشتی شل، ئەم چێشتە دانی کەمە (بەری کەمە). کەمێک لەهەموو چتێک: دانێک گۆشتم بدەیە: کەمێک گۆشتم بدەیە. مرازی چاوگەیە، کە بەدووایی هەندێک ناوانەوە بنووسێ وەکوو: فڕێ دان، ئازاردان، گرێ دان، بەکرێ دان. دانوو.

**دانا** (هەورا.): زانا، شارەزا، تێگەیشتوو، ووریا. ناوی نێرینانە.

**دانار:** دەنک دەنک، دانار دانار، چتێکە کە دانەدانە وەستابێ و تێکەڵ یەکتری نەبووبێ ئەم قوبووڵییە دانار دانارە.

**دانار دانار:** دەنک دەنک، دانەدانە، بۆ ڕۆن و چتی وابێ کە باش تێکەڵ یەکتری نەبوون.

**داناش** (کە.، دەر.): دانەوێڵە.

**دانامە** (ئەردە.): بۆز، مووی ڕەش و سپی.

**دان ئاڵ بوونەوە:** ددان ئاڵبوونەوە، سڕبوونی ددان بەهۆی چتی ترش و ئیتر.

**دانان:** ڕۆنان، خستنەبان زەوی، نهان، دانیان، دانین، دەینان، (هەورا.) ئەرەنیای، داکرن، دانیێ: دابنێ (بۆ فەرمانە)، پەڕتووک ــ: واتە ڕێکخستن، جێگیرکردنی چتێک لەشوێنێک، (هەورا.) نیایەرە. وا ــ، وەها ــ: گریمان، وەگرتن، خەمڵ کردن، قرساندن، واگرتن، خەملاندن، لەناوبردن، دۆڕاندن، چوواندن، زیانکردن، خۆ لەسەردانان، خۆ لەپێناودانان، خۆلەناوبردن، ئەویشی لەسەردانا: واتە ئەویشی لەپێناوی وی داچوواند، پێ ــ: پێ بژاردن، تووشی زیانکردن، تۆڵە لێ ئەستاندن.

**دانانەوە:** بۆ جاری دووەم و پتر دانانی چتێک لە جێگای خۆی. ــ ی مریشک: مریشک نانەوە لەسەر هێلکان لەکاتی کورک بوونێدا. ــ ی شەڕ: شەڕهەڵاییساندن. ــ ی داوو تەپکە: نانەوەی داو و ئیتر. ــ ی. کاتژمێر: کۆک کردن.

**داناو** (ئەردە.): ئاودانی گەنم لەکاتی دانگرتنیدا.

**دان ئێشە:** ددان ئێشە.

**دانە:** دەنک، قل، لف، ڕەزک، دەنکێک لەچتێک، (کۆ.) چەشە، دانەیێکە لەسەر داو و تەپکە دانرێ، چینە، ــ هەڵگرتنەوە: چینە کردن، ژمارە، تەنهایەک دانە. گەوهەر، دوڕ، ئارنجۆکی دەستی، ددانە: ــ ی مشار: ددانەی مشار ــ ی چاو: تەراخومە، لای ژووروووی مەرەزە، کەوانە، دەغڵ و دان و ئیتر. (موک.) دانەی لغاو: ئاسنی لغاو. (ئەردە.) چتێکە وەکوو شانە وایە و گەورەتر و درێژترە هەموودای ڕایەڵی تەنراوی پێدا هاتووچۆ دەکا لەکاتی جۆلاییدا، برێشکە، ــ ی ڕوو: زیپکە.

**دانەبا:** وەبەربادان، بەبادادان. لەبەرد دان.

**دانەبارکرن:** کۆچ پێکران، (ئەمن بەبارامم کۆچ کرد)، بارپێکردن.

**دانەبانا** (ڕۆژ.): لێفە و کەل و پەل بەسەر خۆ دادان.

**دانەبەردان** (باد.): بەرەڵاکردن.

**دانەبەر** (باک.): ڕاونان، دەرکردن. (موک.) وەبەردان. دەست پێکردن.

**دانەبەزە:** مەمکی ئافرەتان یا گوانی وولاخ و ئاژاڵانە لە دەمێکیدا، کە ووشک ببێت.

دانەبرێشکە: برێشکە.

**دانەبنار:** ڕوو لە بناری کێوی کردن. دەورەدان.

**دانەپاش** (باک.): خستنە پشتگووێ، خۆلێدزینەوە.

**دانەپاڵ:** وەپاڵدان، لەگەڵ خستن، ڕێکخستن.

**دانەجووچک** (دەر.): دانەقەتێ.

**دانە پشتگووێ:** تەرکەخەمی، وەپشتگووێ دان.

**دانەچۆلەکە:** گیایەکی بەهارییە بەرێکی دەگرێ وەکوو کەلووی نۆک پڕە لەدان و تۆوی وورد چۆلەکە دەیخوات.

**دانەخاف** (باک.): جوورە گەفێکی شکاو و کوتراوە.

**دانەخۆرە:** بۆ مرۆ و ئاژاڵ و وولاخ و باڵندە و داعبایان، چەشەخۆرە، چێژ، چەشە، چێشتە تەڵە، چەشتە، دانەیێکە بە فاقە و تەڵە و تەپکەوە دەکرێ بۆ گرتنی باڵندان. ــ بوون: چەشەخۆرەبوون، چێژبوون، ڕاهاتن. ــ کردن: چەشەخۆرەکردن.

**دانەدانە:** دەنک دەنک، دانار دانار. پەرێشان.

**دانەدەست:** ئەسپاردن، پێ ئەسپاردن، چیس کرن، بەدەستەوەدان.

**دانەدەم:** خستنی چتێک بۆ سەر چتێک و پێدا دروونی: پەردەکە کورتە قولانجێکی بە دەمەوە بدە. مەیدان دان، ڕوودان، لەدوودان.

**دانەدۆ:** دۆینە.

**دانەدوو** (هەورا.): دۆینە.

**دانەدوواوە:** گل نەدانەوە، وەرنەگرتن، گەڕاندنەوە.

**دانەر:** ڕۆنەر، چێکرۆخ، کەسێکە بناغەی چتێک دابنێ، کە لەوەپێش نەبووبێ. ڕێکخەر، بەستەکار.

**دانەرەڤاندن** (باک.): بە ڕەدووکەوتندان.

**دانەرچە** (کە.): ددانە چیرە لە سەرمان، یان لە ڕقان، دان ڕسکێ، دان ڕیکێ.

**دانەرۆژ:** کاروباری نیوە ڕۆژێک، نیوڕۆژێک.

**دانەرۆکە:** چێشتێکە لەگەنم و نۆک دروست دەکرێ و دەبەشرێتەوە بەسەر دراوسێدا لەکاتێکا کە منداڵی ساوای ئەو ماڵە تازە ددانی ڕووابێ.

**دانەرێز:** فرێدانی ئەو دانانەیە، کە ئاش فڕێی دەداتە ناو ئاردەکەوە.

**دانەرێزە** (خۆ.): ئەو دەنکە دەغڵانەیە کە بەساخی لەنێو بەرداشی ئاشی دێتە دەرێ.

**دانەرێژ:** ئاشێکە دانی دەنک دەنک فڕێداتە نێو ئاردییەوە.

**دانەرێژە:** مەبەس لەفڕێدانی دەنکی دانەوێڵەیە بە ساغی لەبەرداشەوە بۆ بەر دۆڵیان و ناو ئارد.

**دانەزان:** ئاگادەر.

**دانەزانین:** ئاگادارکردن، ئاگادان.

**دانەسەر:** بەسەر و پۆتراکی خۆدادان. بەسەرداداان، پەلامار بردنەسەر. تەمەنی دایەسەر: مرد، کۆتایی بەتەمەنیدا، براندیەوە.

دانەشاخ: یاخی بوون.

**دانەشەڕ:** بەشەڕدان.

**دانەقەتێ** (دەر.): دانەجووچک، برکە گیایەکە ٥، ٦ لقی لێ جووێ دەبێتەوە و لکەکانی بەدەورە گوڵی زەرد دەردەکەن کە ووشک بوو دانی وەکوو کونجی دەردەکا و قەتێ دەیخۆن، وەکوو دانە چۆلەکە وایە.

**دانەقود** (باد.): گەفەکوتاو.

**دانەکوژتن** (باک.): بەکوژتندان.

دانەکولانە: دانوولە.

**دانەگرتن** (باک.): بەگرتندان.

**دانەلغاو:** بەهەمموو کەرەستە ئاسنینەکەی لغاوی دەڵێن تەنها قایشەکەی نەبێ.

**دانەنیشان** (ئەردە.): گەوهەر بەند.

**دانەوان:** دانووان، دانەوین.

**دانەواندن:** نزم کردن، دانوواندنی چتە لەزەوی. بەزین، دەست داهێنان، سەرشۆڕکردن، بەرانبەری نەکردن، دەست نەکردنەوە.

**دانەوانن:** دانەواندن.

**دانەوە:** گەڕاندنەوە، وێدانەوە، چتی وەرگیراو، دانەوە، خاوەندی، دانەوەی چتێک بە کەسێک دووبارە. هەڵکەندن، زەویەکە بدەرەوە: هەڵیکەنە. دوواوەدان، بناغەدانەوە: هەڵکەندن.

**دانەوێر** (خۆ.): دانەوێڵە.

**دانەوێڵە:** هەموو جوورە ووشکە دانێک و دانەوێڵەیەکە، (باک.) ئازۆخە، زاد، (دەر.) داناش، (خۆ.) دانەوێر، (گەر.) دانهێرک. ژووری ــــ: (باک.) تەبەک، دەقداناش.

**دانەوێن:** دانەوێنەر.

**دانەوین** (کە.): دانەوان، چەمینەوە و خۆنزم کردنەوەی مرۆڤ، خەم بوونەوە، چەمانەوە.

دانەوینەوە: دانەوین.

**دانەیەک:** چنگ دانەیەک و پڕبوون و چڕبوونی هێندێ چت (هەرێزەکە داوێتیە یەک)، یەکدان.

**دانەیی فەرەنگ** (ئەردە.): دانە، زەنگار، زاخی شین.

**دان بەخۆداگرتن:** مەبەس لەئارام گرتن و هێمن بوونە.

**دان بەرزتا:** کلکە سووتە، هاندان.

**دان پەی** (باک.): وەدوو کەوتن، وەشووێن کەوتن.

**دان پیانان:** ددان پێدانان. مەبەس لە ڕاستی کوتنی چتێکە.

**دانجیرکردنەوە:** دانچیرکردنەوە.

**دان چرکردنەوە:** دانچیر کردنەوە.

**دان چوونەکلیلە:** دەم چوونە کلیلە.

دانچیرکردنەوە: ددان چرکردنەوە، ددان ڕیچ کردنەوە.

**دانخاف** (باک.): جوورە خووراردەمەنیەکە شێخ عەبدولڕەحمانی ئاختەپی کوتوویە:

دانە خاف و خاڤەدان و سەر بزێر
هنگێ بۆمە ئەز ژوان نا بیمە تێر
لێ چەبێژم پەسنێ ترشا بامیا
تی هەبێ یەک پەرچە گۆشتێ شامیا

ئەو چێشتە وەک هەریسەیە، دان و گۆشت دخن ناڤ و باش دکەلێنن.

**داندار:** دانەدار، پردەنک وەکوو هەنار و ئیتر.

**داندان:** دانەدان بە باڵندان. (کە.) ئالک دان. دانەدان، شووێن ئەنباری گەنم. جلەوشل کردن، جلەوشۆڕکردن.

**داندۆک:** ساوار لەناو دۆی کوندا پەروەردەکرێ دووایە بە سەلک سەلک ووشک دەکرێتەوە، وەکوو ترخێنەیە بە دۆی دەکرێ بەلاَن شێلمی تێ ناکرێ دووایە دەکرێتە چێشت، (هەورا.) دۆینە.

**دانران:** نران.

**داندۆل** (باک.): کلک، جەنجال، منداڵێک، کە برادەرێکی لەگەڵ خۆی بباتەوە ماڵێ دایکی پێی دەڵێ: ئەو کلکە چیە یا چە جەنجالێکە وەدووی خۆت خستووە.

**دانرانەوە:** نرانەوە.

دانراو: نراو.

**دانرسکێ** (کە.): ددانەچیرە.

**دانرپیچکردنەوە:** لچ هەڵقورتاندن و دەرخستنی ددان.

**دانرێز** (کە.): ڕژانی دان لە مەڵاکەوە بۆ نێوەڕاستی قوولکەکەی بەرداشی.

**دانرێوی:** ددانەرێوی، خشڵێکی جووانە لەلای زێڕینگەران.

**دانرێک:** ددانچیر. ــ ی: ددانەچیرە.

**دانزانین** (باک.): بەزانین دان، ئاگاکردن.

**دانزلین** (باک.): هەراسان بوون، جاڕس بوون.

**دانساز** (هەورا.): ددانساز. ــ ی: ددانسازی.

**دانسەر** (باک.): بەهەندگرتن، بەگرنگ زانین.

**دانسپی بوونەوە:** مەبەس لەسام شکانە و ترس نەمانە؛ ددانی خۆت سپی مەکەوە لە منداڵەکانت: سامی خۆت لەوان مەشکێنە.

**دانستە:** تایبەتی، هەڵبژاردە، بژاردە (بۆ میوە و چتی تر).

**دانسقە** (بابا.): دانستە، تایبەتی، نایاب.

**دانش** (ئەردە.): زانست.

**دانشتن:** دانیشتن.

دانشمەن: زانا.

**دانشمەند:** زانا، تێگەیشتوو.

**دانکە:** خرۆکەی باڵندە و ئاژاڵانە و دەتەنێتەوە. پەروەوران لە شووێنە رووتاوەکەی خرۆکەی دەردەکەن، دانوو، دانۆکە، دەردەمریشک، تیمار و چارەی: ئاو ۲۰۰۰ پر مەنگەنات (۱)، باڵندەکە بە تەنهایی لە ژوورێکی دەکرێ و لەجیاتی ئاو ئەو دەرمانەی سەرەوەی بۆ دادەنرێ بە درو سێ ڕۆژان چاک دەبێتەوە.

**دانکەوتەی** (هەورا.): بەجۆ کەوتنی ئاژاڵ و ماڵات.

**دانکەوکەرگی** (هەورا.): دانکە مریشکێ.

**دانکردن** (باک.): دان بە دان بەرخ و کاران بەردەنە لای دایکیان ئاشیری بخۆن. (بابا.) ددان دروستکردن، دانگرتن، گەنمە کە دانی کردووە، واتە دانی گرتووە و شیرەکەی خەریکە ووشک بێ.

**دانکۆتەی** (هەورا.): بەدان کەوتن.

**دانکوولە** (بار.، هەو.): دارکونێرە، باڵندەیێکی دندوک درێژە دارەبەنو هێستر کەرەق بێ کونی دەکا و هێلانەی تێدا دەکات، خۆی بەقەد چۆلەکەیێکییە ڕەنگی ڕەش و سپی و سوورە، پۆپەیێکی نزمی هەیە وەکوو شێست تیر دەنگی دێت.

**دانگ:** کێشێکی ناسراوە لەلای زێڕینگەران بۆ زێڕ و سامان (ملک) بەکاردەبرێ، بەش، پش، پشک، دانگێک: واتە بەشێکە لەشەش بەشان لەزەوی و زاران و ماڵ و خانووان، دوو ــ: دووبەشە لە ٦ دانگان. کەمەکاتێک، (کە.) دانگا. ئەندازە و پلە: ئازاد سیی ساڵ لەمەوپێش چۆن بووە ئێستاش هەر لەودانگەدا ماوە.

**دانگا** (کە.): کەمەکاتێک: مێگەلە کە ــ یەک لەوەڕی: واتە کەمێک.

**دانگانە:** مزومافێکە و بەشێکە لەدانگێک کە دەدرێ.

**دانگە:** پارچە خاکێکە لەنێو پاوانێکیدا، کەمەڕی تێدا بلەوەڕێندرێ. نێزیکی مەڕی، ڕۆخی مەڕی. لەکوێستانانندا شوێنێکە لەسەر بەفری ئالیکی بۆ مالاّتان پەرت دەکەن تا بیخۆن، (باک.) بەرکۆز. (جا.) لای خوارەوەی مێگەلانە، ئاوەژووی (کەوانە)یە. (سزیر.) داوێن، دامان.

**دانگوو** (ئەردە.): نەبەستراو، دانەدانە.

**دانگی** (باک.): دەمێکی ئەو تۆیە، کە تفاقی تێدا دەدرێ بە ئاژاڵ و وولاّخان.

دانگی دانگی: دانگانە.

**دانگیر:** دانەوێڵەیە کە، کە نیوەکوڵ بووبێ. چیکنە.

**دانلا** (کە.): دەرگاکردنەوەیە، پاڵ پێوەنانە.

**دان لێ تیژکردن:** مەبەس لەچاو برینە چتێک و بە تەمابوونی.

**دانمان** (ڕۆژ.): داتەپین.

**دانماندن** (ڕۆژ.): داتەپاندن.

**دانمویژ:** مێوژدان.

**دانۆک** (باک.): شیرینێکە دەدرێ بە خەڵک لە کاتێکیدا، کە منداڵ هەوەڵ ددانی دەردەکات.

**دانۆکە:** دانکە، دانەچۆلەکە، دانوو، گیایەکە بەرەکەی دانێکی دێنی، کە خواردنی چۆلەکانە. دانوکە، خرۆزکەی باڵندە و ئاژالاّنە.

**دانوو:** دانولە، گەنمی کولاّو، دانولانە، دەهنوو، دانکە، (زا.) ساوار، پەلکە. نەخۆشییێکی باڵندانە و هەلاّمەتییانە. (باک.) چێشتێکە لە دان و نۆک و پیواز دروست دەکرێ جارجارە گۆشتیشی تێدەکەن.

**دانووان:** دانەوان.

**دانوواندن:** دانەواندن، چەماندنەوە، خووارە و هاووردن.

**دانووانن:** دانوواندن.

**دانووسان:** پێدانووسان، گەزتن.

**دانووساندن:** پێدانووساندن، گەزتن، خۆ ــ : خۆگرتن بەنهێنی بۆ بیستنی ڕازی ئەم و ئەو.

**دان وستاندن** (باک.): بازرگانی.

**دانوشتان:** نوشتانەوە، ڕەق بوونی چت.

**دانوشتاندن:** نوشتاندنەوە، دوورقەدکردن و دەق کردنی هەندێ چت.

**دانوشتانن:** نوشتاندنەوە.

**دانوشتاو:** نوشتاو، چتی نوشتێنراوەی دەق کراو.

**دانووکە:** دانۆکە.

**دانوولانە** (ڕۆژ.): دانوو.

**دانوولە:** دانوو، گەنمە کولاّو، (ڕۆژ.) دانوولانە، چێشتی گەنم و نۆک. جوورە گیایەکە ئاژاڵ دەیخوا.

**دانەهەڤ:** کۆکردنەوە.

**دانەهەنگوور** (ئەردە.): هەنگووردان، دەنکەکەی لەنێو گلووی ترێی دایە.

**دانەهێر** (باد.): گەنمەکوتاو.

**دانەهێرک** (گەر.): دانەوێڵە، (باد.) برێش، گەنمەکوتاو.

**دانێلە** (کە.): دانەوێڵە.

**دانی** (ڕۆژ.): دابەستە، دابەستوو، دابەستی.

**دانیان** (ئەردە.، کە.): دانان. دۆڕاندن، چوواندن، لەدەست دەرکردن. دامەزراندنی دیوار و کۆڵەکەوئیتر.

**دان یەک:** لێکدان.

**دانیشاندن:** ڕۆنیشاندن، روونشتاندن.

**دانیشتگە:** (هەورا.) نیشتەیرە، (باک.) جڤانگە، جڤینۆک، روونشتاخ، کۆمەڵگە، ڕۆنشتگە، روونیشتگەهـ، شێنی.

**دانیشتن:** ڕۆنیشتن، (هەورا.) نیشتەیرە، نیشتنەبان زەوی، (هەورا.) ئەرە نیشتەی، نیشتن، ڕۆنین، قووندانەوە، قنگدانەوە لەسەر زەوی یا لەسەر چتێکی تر، دانیشە: بیشە، بنیشەرە، (زا.) روونێ.

**دانیشتنەوە:** (باک.)کتووت.

**دانیشتوو:** ڕۆنیشتوو، دانشتی، روونشتی، کەسێکە قنگی دابێتەوە. نیشتەجێ، کەسێکەماوەی مووچە خۆری میری تەواوکردبێ. ــ یی: نیشتەجێیی.

**دانی کرمۆڵ** (هەورا.): ددان کرمێ، ددان کرمۆڵ.

**دانین** (باک.): دانان، ڕۆنان، ــ ئەردتی: لەسەر زەوی دانان، ــ جە: لە جێگای خۆی دانانەوە. خووە لخەو ــ : خۆڵە خەوکردن، خووە لێ ــ : ماستاو و مەرایی کردن، باوەڕ نەکر من ئانی دانی بەر چاڤی وی: باوەڕی نەکرد من هێنام بۆلەبەر چاوی وی داناوە، بادانی: بای خست و بڕا، باکەوت، ئەرناوی ــ : هێدی و هێمن بوون، ئەزێ دێنم تە: لێتدەدەم، ژهەڤ دانین: پیادە کردن، ژخووەدانین: داکەندن (بەرگ)، لخووەدانین: لەخۆ گرتن، خۆ بە کەمزانین، خۆبەکەمگرتن، دەینە، دێنە، دێنە: دانێ، داینێ.

**داو:** هەودا، تاو، داوەدەزوو، تاڵ، (ڕۆژ.) تەڵ، (هەو.) کەڵ، تاڵە ــ نەی: داوەدەزوو، (باک.) لێڤ و غراغێ کراس و خەفتان و بەرگێ مرۆڤە، داوێن، پاشڵ. (باک.) داڤ، شرک، مەسەف، داوی تەپکە و ئیتر بۆ ڕاوی باڵندان، (باک.) چەنبەر، داڤک، دەهفک، تەڵە. تالەە، رووشە، پەند، تەلەزگە، دام، سنگ، مەمک، داوێن، (زا.) داوێن، کەڵەک، فێڵ و فەرەج.

**داوا:** ویستن و خوواستن بەزمان یا بە نامە، گەرەک، ویست. شەڕ، جەنگ، قڕە، دنگەشە، دوژمن.

**داواچی:** داواکار.

**داواخوواز:** داواکار. خووازیێتی کار. ــ ی: داواکاری، خووازیێتی کردن.

**داوارانن** (ئەردە.): داباراندن، دارژاندن.

**داوارین:** داباریں.

**داواکار:** کەنۆ، کوومکافر، گلیڤان، گلەیی کار، گازاندەکار، داواخوواز. ــ ی: گلەیی کردن، داواکردن.

**داواکەر:** داواکار، داواخوواز.

**داواکردن:** ویستن و خوواستنی چتێک لەیەکێک بەهۆی زمان یا نامەوە

**داوان** (کە.): داوێن، (ئەردە.) خووازگار.

**داوەنگیر:** داوێنگیر. ــ ی: داوێنگیری.

**داوەت:** (زاخ.) داڤەت، (زا.) هەڵپەڕین، دیلان، دیلات، شایی، هەڵپەڕکێ، گۆڤەند، زەماوەند، زەماوەن.

**داوەتنامە:** نامەیێکە بۆ بانگهێشتن بۆ سەر داوەت و زەماوەند بۆ دۆست و برادەر و ئاشنا و خزم و دراوسێیان دەنێردرێ.

**داوەر:** لە دادوەر کورتکراوەتەوە، خودا، پادشای دادگەر.

**داوەران:** بەرە و ماڵ و هێلانە چوونەوەی وولاّخ و ئاژاڵ و باڵندان، یا بەرە و هەر شوێنێکی کۆبنەوە، داوەرزین، داوەرین. داوەشان.

**داوەرانەوە:** داوەران.

**داوەراندن** (باک.): داوەرڤاندن، خاوێنکردنەوە، پالاّوتن، وەراندنی چت بەزۆری، هەڵوەراندنی دانەوێڵە بەدەست یا هەنار داوەراندن.

**داوەرانن:** داوەراندن.

**داوەرە:** ئاوەرە، ساوەرە، (هەورا.) ئابۆرێ.

**داوەرزین:** داوەران.

**داوەرڤاندن** (باک.): داوەراندن، خاوێنکردنەوە، پالاّوتن.

**داوەرڤین** (باک.): داوەرین، خاوێن بوون.

**داوەرۆزی:** باڵندەی کەوی یا کێوییە چاوەڕووانی هەڵنیشتن یا ڕاوکە یا جێگای ڕاوکەی بکات، (موک.) داوەڵۆزە.

**داوەرووکان:** لەسەر چتێک کۆبوونەوە و کەڵەکە کردن، تێوەرهاتن، پێوەربوون، دارژانی باڵندان و گیان لەبەرانە لەسەر چتێکی.

**داوەری:** خودایەتی، خولایەتی. دادپرسی.

**داوەرێس:** ئاوەرێس.

**داوەرێن:** تێوەرووکان.

**داوەرین:** داوەران، داوەشان.

**داوەزان** (زەن.): دابەزین.

**داوەزاندن** (زەن.): دابەزاندن.

**داوەزین:** دابەزین.

**داوەستە:** دابەستە.

**داوەستن** (ئەردە.): دابەستن.

**داوەسێن** (ئەردە.): خووێدار، خوویداری کار، کەسێکە وولاّخی بەکرێ بگرێ.

**داوەشان:** داوەشین، هەلاهەلا و پارچەپارچە بوون، تەکان، داتەکان، داوەران، داوەرین. دافەتان، دارژان، بچکان، پورتکان، ڕزان، کەنەفت بوون، بۆ جنێویش بەکاردەبرێ.

**داوەشاندن:** تەکاندن، داتەکاندن، داوەراندن، جلی مۆرانەدار لەناو تەندووری گەرمدا هەژاندن تا کێچ و ئەسپێیەکانی لە تەندووریّ بکەوون. دەست هەڵێنانەوە بۆ لێدانی کەسێک یا چتێک یا هەر گیانداریکی بێ، بۆ ـــ ی دەست و پێ و لێوی قەڵەشتوو: تۆوی غەربەند و بەزی ڕەشان و مێوی لە ئاوری داوێن هەر جێگایەکی قەڵشی بێ بەئاور و دووکەڵی دەرمانە دابگیرێ و سەریشی داپۆشرێ و بەدەستی داکوترێ و ئاویشی لەژێر دابنێن کرمی قەڵشاوەکەی تێدەکەوێ و قەڵشیوە کە چاک دەبێتەوە. چاندن، تۆوچاندن.

**داوەشانن:** داوەشاندن، شڕکردن، پارچەکردن. داڕزاندن، دافرەقانن.

**داوەشاو:** پوورتکاو، دافەتاو، ڕزاو، داڕزاو.

**داوەشیاگ** (ئەردە.): داوەشاو، کێڵراو، وەشیاگ، داڕزیاگ.

**داوەشیان:** داوەشان.

**داوەشێن:** داتەکێن. تۆوچێن. شڕکار، دادڕێن.

**داوەشین** (باک.): داوەشان، تەکان بە خۆدان، خۆداوەشاندن.

**داوەکا:** (هەو.) شەڵتە، ڕەشکەی کای گەورە و سەراوەڵەیە.

**داوەکۆستە:** باڵندەیێکی کێوییە لە کەو گچکەترە بە هەنگاو دەڕوا دوو تاکە پەڕ بە پشت ملییەوەیە، کە دەڕوات پەڕەکان قیت دەبنەوە.

**داوەڵ:** (شەقە.) شەمووڵە، (باک.) ڕەش، (حەریر.) قەیلۆک، (کە.) داووڵ. کێشکچی دارینەیە لەنێو بێستاناندا دەچەقێنرێ بزگوڕ و پەڕۆ و پالاّتی زۆری تێ ئاڵێنراوە چۆڵەکە و گەلێک جۆرە پەڕەووری لێ دەسڵەمێتەوە و لەترسان لەوێ نانیشن. ئەو چڵەگەغانەیە دووای درووێنە بە باڵندی و قیتی دەمێننەوە.

**داوەڵۆزە** (موک.): (کۆ.) ڕاوکەدۆزی، داوەڕۆزی، هەوڵ و تەقەلاّی بڵندانی هێلکەکەرە بۆ دۆزینەوەی ڕاوکە.

**داوەسکە** (کۆ.): داموسک.

**داوباز** (ئەردە.): ڕاوچی. فێڵباز، کەڵەکباز. ـــ ی (ئەردە.): ڕاوچێتی. فێڵبازی.

**داوبەست:** (ئەردە.) دادوبسەد.

**داوبسەت** (ئەردە.): دادوبسەد، کڕین و فرۆشتن.

**داوخوواز:** داخوواز، ئارەزوو، دڵخوواز، ئاوات. کڕیار، هەڵوەستاو. ـــ ی: کڕین. خووازبێنی کردن.

**داوداخستن:** داونانەوە، داونیانەوە. تەپکەنانەوە.

**داودانانەوە:** داوو تەپکەنانەوە، تەڵە یا تەشقەڵە دانانەوە.

**داودو:** تاتا، دانەدانە، بلاّو و پەرێشان.

**داوودە:** تیرەیەکی کوردە لەکەناری کەرکووکێ.

**داوور** (ئەردە.): دابڕ.

**داوران** (باک.): قووتدان، بداورە: قووتدە.

**داوریان:** داوەرووکان.

**داوورین** (ئەردە.): دابڕین.

**داووزان** (ئەردە.): دابەزین، پیادەبوون.

**داووزاندن** (ئەردە.): دابەزاندن، پیادەکردن.

**داووزانن** (ئەردە.): دابەزاندن، پیادەکردن.

**داووزیان** (کە.): دابەزین.

**داووزیاندن** (کە.): دابەزاندن.

**داووزین:** پیادەبوون، دابەزین.

**داووس:** ئاوروس، لەپێشدا بە ئاسمانێ کوتراوە لە دووایەدا بۆتە تاوروس.

**داوکەفتن:** کەوتنە ناو داوەوە.

**داوگە:** جێگایەکە داوی لێ دادەنرێتەوە، داوگا. جێی تەفرە خوواردن و بە هەڵەچوون.

**داووڵ** (کە.): داوەڵ، داهۆڵ.

**داولێدەر** (ئەردە.): ڕاوچی، داوباز، کەڵەکباز، ساختەچی.

**داوودەرمان:** هەموو جوورە دەرمانێک. بەهاراتی چێشتێ.

**داوودکیدوونکل** (باد.): پەپووسلێمانکە.

**داوودڵ:** تاسە، ئارەزوو، بە ــ : بەدڵ و گیان ئارەزوومەند، بەتاسەوە، تاسەدار، خووینکەل، بە ــ ی.

**داوودی** (باک.): نیم تەنەکەیەکی شەبەکەدارە. دەنگی سەخت.

**داوودێرۆنکل** (زا.): پەپووسلێمانە.

**داووڕداووڕ** (ئەردە.): دابڕدابڕ.

**داووڕین:** دابڕین، قسەبڕینەوە.

**داووسیان** (باک.، نەه.): ئاوابوون، بزربوون، پەنهان بوون. چتێکە لەبەر چاوان بزر و گوم ببێ وەکوو ئاوا بوونی مانگ و ڕۆژ.

**داووڵ:** داهۆڵ.

**داووڵین:** ورلێینی چت بەزۆری بەسەریەکتریدا.

**داونانەوە:** داونانەوە بۆ نێچیر. کەڵەک و فێڵ دروستکردن بۆ مەردوم.

**داونیانەوە** (ئەردە.): داونانەوە.

**داوێن:** داو، داوان، (باک.) پیشک (سزیر). دانگە، چمک، شەبخان، (هەورا.) چاک، دامنە (تەنها بۆ کراسە)، (دەر.) دامان، دەڤتێن، شاقەل، (شن.) تەشک، ــ بەلاداکردن: داوێن هەڵکردن، داچناندن، دەستم بەداوێنت: هیزە، ئامان، لەمنت کەوێ. جێگای شەرمە لە لەشی مرۆیاندا.

**داوێنپاک:** پاکداوێن، پارێزگار، (باک.) پاکداو. ــ ی: پاکداوێنی، پارێزگاری، (باک.) پاکداوی.

**داوێن پیس:** (باک.) خوارده (خووارده). ــ ی: (باک.) خووارده‌یی.

**داوێنگیر:** دامانگر، دەستەودامان، داوێنگیر.

**داوێنگرتن:** دامانگرتن، دەستەودامان بوون.

**داوینگیر:** داوێنگر، دامانگر، دامانگیر، داوان گیر. ــ ی: دامانگیری، داوانگیری.

**داوی** (باک.): دووایە، پاشان، لەپاشان، پەرتال.

**داهات** (موک.): قازانج، سوود. دەرامەت.

**داهاتگ:** داهاتوو، تازە پەیدابووگ. ڕاهاتوو، ڕام بوو.

**داهاتن:** لەنووێوە پەیدابوون، لەنەبووەوە ڕوودان، پەیدابوون، سەرهەڵدان، بوونە باوی چتێک، تازەهاتن. ڕۆچوون، تەپین، داتەپین، ــ ی سەریان و نیتر. ــ ی دار و چتی ڕاست: خوواربوونەوە، چەمان، کووڕبوونەوە. ڕاهاتن، هۆگربوون، ڕام بوون. هاتنەخووار. دوو پارچەبوونی دار بەمشار. شانەکرانی موو و زولف و کاکۆڵ. ڕووت بوونی دارودرەخت بەهۆی داپاچینی لقەکانیەوە. فێربوونی چارەوێ و وولاخ بۆسوواری و بارەبەری و جووتکردن.

**داهاتنەوە:** کۆم بوونەوە، کووڕبوونەوە، چەمیانەوە، چەمانەوە، چۆمانەوە، نووچانەوە، قەمچانەوە، قیچانەوە.

**داهاتوو:** تازە پەیدا بوو، تازەهەڵکەوتوو، چتێکە تازە باوی سەندبێ. گیانداری ڕام بوو. درەختی هەڵپاچراو. چەماوەوە، چڤناک، خوواربۆوەوە. دارێکە بەمشار کرابێتە دووپارچە. چاوێکە دەستی بەژان و گل کردبێ. موو و پرچ و کاکۆڵی شانەکراو.

**داهاڕین:** هاڕین.

**داهانین:** داهێنان.

**داهاووردن** (ئەردە.): داهێنان. ڕام کردن، گرۆکردن. بڕین، بڕینەوە بەمشار. شانەکردن (پرچ و کاکۆڵ). (ئەردە.) هێنان، باوکردن، دەرهاووردن.

**داهەراندن** (باک.): پەز و هەموو جوورە ئاژاڵێک ناردنە سەر خووێ و ئاوێ.

**داهەلاندن** (باک.): هێنانەخووار، داهێلان.

**داهەلیان** (باک.): خۆداهێلان، خۆداهێشتن.

**داهۆڕ** (ئەردە.): چتی دەلبی شەپ و شۆڕ، دلپ، گوشاد، فراوان.

**داهۆل** (باک.): دەهۆڵ، تەپڵی زۆر زل.

**داهۆڵ** (بابا.): داوەڵە، (ئەردە.) هەراسە، (ئەردە.) داوول، مەترەس، سەرەکەر. چتێکە وەک زەلام لە دار دروستدەکرێ لەنێو کشت و کاڵدا دەچەقێنرێ بۆلێ سڵەمینەوەی باڵندە و جانەوەرانە.

**داهێزان** (کۆ.): داهێزران، سست بوونەوەی مرۆ. شل بوونەوەی هەویر.

**داهێزاندن:** داهێزراندن، لەش ــ : لەش داهێزران.

**داهێزران:** سست و خاوبوونەوەی مرۆ، (کۆ.) داهێزان، لەش قورس بوون و تێکچوونی بەهۆی نەخۆشییەوە، شل بوونەوە و ئاو دانەوەی هەویر لەبەر زۆرمانەوەی: هەویرەکە داهێزراوە و نانی لێ نایێت.

**داهێزراندن:** داهێزاندن.

**داهێزراو:** لەشگران، خاو و سست.

**داهێزیان:** داهێزران، داچوون، شل بوونەوەی هەویر و ئاودانەوەی بەجۆرێ نەکرێ بەنان.

**داهێشتن:** ڕۆهێشتن، داهێلان، شۆڕکردنەوەی چت، داکێشان، (هەورا.) ئاسەنەرەی، خۆ ــ : داهەلیان. شۆڕکردنەوە، دادێران. درێژ بوون و ڕەق بوونی هەرامەی ئەسپ و گوێدرێژانە.

**داهێلان:** داهێشتن، داهەلاندن.

**داهێنان:** ڕەخساندن، ئافەریدکردن، (باک.) بەردەباری کردن، هەڵبەستن، هەڵنان. ڕۆچوواندن، تەپاندن، داتەپاندن. ــ ی پرچ و کاکۆڵ: شانە کردن. لەتکردنی دار بەمشار. ــ بۆ هەور و بەفرو بارانە، واتە: هەورێکی زۆر و سەخت و سامدار پەیدابوون. ڕامکردنی گیاندار بە تایبەتی چارەوێ و وولاخ بۆسوواری و بارەبەری و جووت. داپاچینی دارودرەخت، لەتکردنی بەمشار لەسەر باری درێژی.

**داهێنانەوە:** خووارکردنەوە، چەماندنەوە، کووڕکردنەوە، کۆمکردنەوە، چۆماندنەوە، فساندن، قەمچاندنەوە، قیچاندنەوە. داتەپاندنەوە. ــ ی پرچ: دووبارە شانەکردنەوە. بۆ هەور و باران و بەفر واتە: دووبارە سەر هەڵدانەوەی هەور و بارانە یا بەفر.

**داهێنەر:** دۆزەرەوە، ڤەداندەر. چەمێنەر، چەمێنەوە، داهێنەر. (باک.) بەردەبار.

**داهی:** زیرەک و زانا و تێگەیشتوو، ووشیار.

**دای** (سۆ.): بۆ تاکە کەسێکی نەدیو بۆ کاتی ڕابردوو سەرچاوە (چاوگە)ە کەی (دان) ە، (هەورا.) دان.

**دایان:** دایە، دایەن، تەیان، تایەن، مەمە. ــ ی: دایەنی، (ئەردە.) مەمەیی.

**دایانی زارۆڵەی** (هەورا.) : لەلەی منداڵان.

**دایە:** هۆدا، دایکێ، دادێ، دایک، دایەلە بەتایبەتی منداڵان لە کاتی بانگهێشتن و ئاخوتنی دایکیدا بەکاری دەبات، (باد.) لەلە، تایەن، دایان، دایەن، تەیان.

**دایەبەری** (ئەردە.) : دایەدەمی، بەدەمییەوەداوە.

**دایەبەریا** (ئەردە.) : کەفتەبەرەو، پێشکەوتوو.

**دایەخ:** کەڵک، بە ـــ م دەرنایەت.

**دایەخستن:** داخستن.

**دایەدەمی:** بەدەمییەوە داوە، لەدووی داوە.

**دایەدێم:** ـــ گورگ دەتخوا، گەمەیێکی منداڵانەو کچانە.

**دایەق:** دایەخ.

**دایەلە:** دایە، دایکێ، هۆدا.

**دایەلکە:** پەتێکە سەرێکی دەبەسترێ بە (کەوچکە) ی ئاشەوە و ناوەڕاستیشی دەبەسترێ بە (مەچەکە) وە، سەرەکەی تری بەردێکی کونداری پێوە دەبەسترێ بۆ کەم و زۆر کردنی دان و دانەوێلەکە دەڕژێتە ناو گەرووی بەرداشەکەوە بۆ هاڕین. دایەمەمدە بە گورکی ڕۆڵە عیلاجم نییە، دونگڵمەرانێ، دونگڵمەڕێ، گەمەیێکی کچۆڵانە.

**دایەن:** (کە.) داییێن، تایەن، دایان، (هەو.) تەیان، کارەکەر، کڵفەت، ئافرەتێکە منداڵی کەسێکی تر بەشیری خۆی بەخێو بکات.

**دایەندە** (باک.) : بدەر، ئەو کەسەیە کە بدا.

**دانی بەچاوییەو** (ئەردە.) : بەچاودادانەوە.

**داییەنە** (هەورا.) : پێدان.

**داییۆوە** (هەورا.) : پێوەدانی دەرک و پەنجەرە و ئیتر.

**دایرە:** چەمەرە، چەڵەمە، کەمە، ئاخڵە، تەنوورە. دەفە.

**دایق دەرهاتن** (ئەردە) : چارەگرتن، ئێخەگرتن.

**دایـــک:** دێ، دی، داڵـــک، دادا، (بـاک.) دا، دێ، (هـەو.) داک، (هەورا.) ئەدا، نە ذا، (زا.) دیا، دایە، هاوبەشی ژیانی باوکی منداڵانە و منداڵی دەبێ.

**دایکانە:** داکانە، داڵکانە، وەکوو دایک، نرخ و مزو مافی دایکێتی.

**دایکە:** دایک. چۆلەکەی مێ.

**دایکەدزانە** (هەورا.) : دەستکیس.

**دایکەلێ:** ووشەیەکە لە رووی دڵسۆزێتییەوە بە دایک دەووترێ.

**دایکەمارانە:** داکەمار، داڵکەمارانە. داعبایەکە لە شێوە و گەورەییدا وەک قومقومۆکەی وایە و لە مارمێلکەی گەورەترە زۆر بە توندی دەڕوا و لە پڕرا ڕادەوەستێ، ڕەنگیشی وەهی مارمێلکەی دەچێ.

**دایک برا:** داکبرا.

**دایک مردگ** (ئەردە.) : دایک مردوو. مێوەی ڕزیو.

**دایک مردوو:** دایک مردگ.

**دایکێ:** لە کاتی ئاخۆتن یا بانگ کردنێدا بۆ دایک بە کاردەبرێ.

**دایکێتی:** داکێتی، داڵکێتی، دیێتی.

**دایکێن:** جوورێکە لەیاری شەقێن.

**دایلان:** سەیر، ناوێزە، نەدیتوو، واق و وورکار، چاڤزێلک، رەمـــوزن، نەبیستراو، نەبیستی.

**داینە** (ئەردە.) : داوێن، بناری شاخ. داوێنی جل و بەرگ. لێی گەڕێ، بیهێڵە، بێڵە.

**داینەگیر** (ئەردە.) : داوێنگیر، پاگیر، نەهێڵ.

**داینەی زین** (ئەردە.) : داوێنی زین.

**داینەی کێف** (ئەردە.) : داوێنی کێوی.

**داییۆ وەڵێ** (هەورا.) : دانەپێش.

**دایوەنە** (هەورا.) : لێکدان.

**داییێن:** دایەن، تایەن.

**دایی** (زا.) : دۆوکە.

**داییتی** (باک.) : دایکێتی.

**داین:** دان، (زا.) دایەن.

**دە:** دەه، ژمارەیێکە لەنێوانی ٩ و ١١ی دایە. (ڕەوا.) دەنێو، دەناو، لەدوو، (باک.) نێو، دوو، ل، د، دلێ، بەسەری ووشانەوە دەنووسێ: دەقابی کە: لەناو قابی، کە زۆر جاران کە(دە) بەسەری هەر ووشەیێکەوە بنووسێ (دا) ش لەدووای ووشەکە دادەنرێت تاواتای هۆکاری شوێنی و چاخی تەواو بگەیەنێ وەکوو: دەماڵێدا کەسم وەبەر چاوی نەکەوت !!! دەرۆژگارێدا مرۆڤ زۆر دەچرووسێتەوە. بۆ جەخت کردن و هاندان دەخرێتە پێش کردارانەوە وەکوو: دەبخۆ، دەبمدەیە، دەدانیشە، دەوەرە. با: دەبڕۆین: با بڕۆین. (موک.) بۆ بەندیوارییە: ئاغای دەمن: پەرتووکی دەمن. لەکاتی جنێواندا بۆ مرۆڤانیش بەکار دەبرێ. بۆ دووا ڕۆژە بەپێش کردارانەوە دەنووسێ: دەڕۆم، دەنووسێ، دەڕوانێ. بۆڕابردووی نەپساوەوەش بە ڕاناوانەوە دەنووسێ و هەردووکیان دەخرێنە پێش کردارانەوە: پاردەمخووێند، دووێنێ کەتۆهاتی دەمان نووسی.

**دەئێڵقە** (ئاو.) : دێو، شەیتان.

**دەئێڵقەپەسنە** (ئاو.) : دێو و شەیتان پەرست، ئەو کەسەیەکە ڕێ و ڕەووشتی زەردەشتی نەگرتبێ.

**دەبا:** (باک.) دەجا، با، بلا، ـــ بڕۆین: بابڕۆین، مرازی هاندانە دەخرێتە پێش کرداری تێراخوورینی ئامادە و بزر، بۆ کاتی ئامادە لە مەولاو ڕابردوو، ـــ بچێ، ـــ چووبا.

**دەباخ:** (دزە.) تێشوو، (خۆ، دزە.) بۆنگ، چەرمچی، چەرمگەر. ـــ کردن: پوویین.

**دەباخانە:** دەباخ خانە: شوێنێکە کەوڵ و پێستی تێدا دەباخ دەکرێ.

**دەباخچی:** کەسێکە کەوڵ و پێستەی دەباخ بکات.

**دەباخ خانە:** دەباخانە.

**دەباخدان:** خاراندنی کەوڵ و پێستەیە بەهۆی جەوت و مازووەوە.

**دەباخکردن:** دەباخدان.

**دەبار** (باک.) : ئامادە، ڕێک و پێک. ـــ بوون: ئامادە و ڕێک و پێک بوون. ـــ کرن: ئامادەو ڕێک و پێک کردن.

**دەبەشیر:** چتێکە بەڕەنگ وەکوو شیری و لە گێچی دەچێ، لەسەر تەختەی ڕەش پێی دەنووسن.

**دەباغ:** دەباخ.

**دەبان:** (باک.) دابان، دەبیان، جووره تیغێکی باش و جەوهەرداره خەنجەر و شیری لێ دروستدەکرێ. (باک) قایم.

**دەبانچە** (هەورا.): دەمانچە. (باک.) ئەو دارەیە پێی لەتەپڵ و دەهۆڵ و دەفەی دەدەن.

**دەبە** (زەن.، هەورا.، کۆ.، کە.): ترنجی گەورەیە و بەگونی قۆڕیش دەڵێن.سوواغ یا دیوارێکە هوڵۆڵ بووبێ و وورگی دابێ. بۆ گیسانداری ئاوویسیش بەکار دەبرێ، وورگن. پیپ (بەرمیل) دەببە (موک.): شلّتاخ، گڕە، کغنی، چاچۆڵە.

**دەببە** (موک.): شلّتاخ.

**دەبەرمردن:** بەقوربان بوون، لەبەر پاڕانەوە.

**دەبەگون** (زەن.، هەورا.، کۆ.، کە.): قۆڕ. ــ ی: قۆڕی.

**دەبەنگ:** حۆل، گێژ، وور، هێڕ، سەرسام، سەرداسەر، دەویت، سەڵیتە. ــ ی: حۆلی، ووری، سەرسامی، گێژی، کاسی.

**دەبدەبە:** شکۆ، تەنتەنە، هنگ و دەنگ، زەمزەمەی شادی، هینگ و دەنگ، شان و شکۆ، بەــ : زۆر جوان، بەدەو، پڕتەنتەنە، تێر هنگ و دنگ. (ئەردە.) زرم و کوت، دەحادەحا، دەنگەدەنگی مەردوم یا هی سمی یەکسمان.

**دەبدیم** (ئەردە.): دمبلّی دیپاو، دەنگی تەپڵ.

**دەبر** (زا.): ژیان و گوزەران.

**دەبرە:** مووچە، جیرەی فەرمانبەر و نۆکەر و ژێردەستان.

**دەبقان** (باک.): تووێژاڵی بن تیکوڵی داری ئاس کە دەکرێتە چریش (چەسپ).

**دەبک** (زاخ.): (هەورا.) دیبەگ، تەختە.

**دەبلاخ:** دەبلاغ، گۆلکی ووشتری یەکساڵانەیە.

**دەبنی** (دزە.): دەق، وەک، وەکوو دەڵێی.

**دەبوستان:** قوتابخانە.

**دەبووقان** (زا.): دەمووکانە.

**دەبوو:** دەشیا.

**دەبوایە:** دەشیا.

**دەبووش** (باک.): پێوە نووسان، چتی لینج. ــ بوون: پێوە نووسان

**دەبێ:** دەشێ، ئەشێ، ئەبێ، دبووک، دێ، شاید، لەوانەیە، هەیهایە، وێدەچێ.

**دەبیر:** رازنووس، نووسیار (سکرتێر).

**دەبیش** (باد.): لینج، لنج.

**دەپ** (زا.): تەختەدار، یا پارچە تەختەییێک.

**دەپە** (زێ.، باک.): تەختە، تەختەی ئەستوور، دەپێ سینگێ: تەختەی سینگی.

**دەپدەپە** (باک.): دەبدەبە، شکۆ، گەورەیی، مەزنی.

**دەپڕەش:** تەختەی ڕەشی قوتابخانە.

**دەتیر:** دەمانچە و تفەنگێکە، کە دە گوللان بخووات.

**دەجلە:** زێیەکی ناودار و گەورەیە بەناو شاری بەغدایەدا تێدەپەڕێ سەرچاوەکەی لە ژووررووی شاری ئامید (دیاربەکر) ییە.

**دەجا:** سا، با، بلاّ، دەبا، دەسا، دەوجا، دەیجا، ئیدی، ئیتر.

**دەجاڵ:** درۆزن.

**دەچاوکە:** دەچاوکەی دڵ، دەسگای تەن.

**دەحا:** تەحا، ئەحا، دەئە.

**دەحادەحا:** تەحاتەحا.

**دەحبا:** دڕندە، جانەوەر.

**دەحبە** (زا.): دڕندە، دەحبا.

**دەحجانی:** مرۆ یا داعبایەکە زۆر بەسام بێ.

**دەحشک** (زا.): جاش و جوانوو.

**دەحکیان** (باد.): ڕزین، هەڵوەرین.

**دەحل** (باد.): دارستانی کەم، (زا.) باخ و بێستان.

**دەخەز:** ڕق، قین، ڕک. دەغەز، وەرەم، دەردە باریکە. دیق.

**دەخەزدار:** ڕقدار، قیندار، ڕق ئەستوور. دەغەزدار، کەسێکە تووشی ئازاری دەردەباریکەی بووبێ، دیقدار. ــ ی: ڕق ئەستووری. دیقداری.

**دەخەڵ:** قەڵب، کەسێکە کارێکی لەدەست بێ و نەیکا، سست، ناڕاست، زەخەڵ، تەمبەڵ، شەشلۆ، ساختەچی.

**دەخس** (باک.): بەدخوواز، چاوپێ هەڵنەهاتوو، مرۆی ڕژد.

**دەخساندن** (باک.): بەد خووازی، چاوپێهەڵنەهاتن.

**دەخسۆیی** (باک.): بەدخووازی، چاوپێهەڵنەهاتن.

**دەخسین** (باک.): بەدخووازبوون، چاوپێهەڵنەهاتن.

**دەخڵ:** خەلە، گەنم و جۆ، دەغڵ، دانەوێڵە. سوود، قازانج.

**دەخلە** (ئاک.): دارێکی دڕاوییە لەکەنار باخچان دەچێنرێ بەرەکەشی پان و خڕ و چکۆڵە و دانەدانەیە.

**دەخڵدان:** دەغڵدان، دراودان، جێگای پارە تێدا کۆکردنەوە.

**دەخڵ و دان:** دەغڵ و دانەوێڵە، خەلەودان، پارە. دەغڵودان. پارەدان.

**دەخمە:** ئەشکەوت، غار، چاڵ، قووڵکە.

**دەخیل:** پەنابردن، وشەی پاڕانەوەیە.*

**دەر:** دەرەوە، چۆل، دەشت، (باک.) دەراهیا، بچۆدەر: بڕۆ دەرەوە. ــ بوون: ئاوەڵە بوونی سەری برین و قوونێر و ئیتر. ــ کردن: ئاوەڵە کردنی سەری برین و قوونێر و ئیتر. (باک.) دەرک، دەرگا. جێ، جێگا، جێگە، شووێن.

**دەڕ:** (ئەردە.) دەڵ، مالۆس، دڕندە، بەرازی مێ یینگە.

**دەڕبە:** چتێکە لەچینکۆ دروستدەکرێ بۆ دەرگای دکانان.

**دەرابدان** (زا.): قارسکردنی کالاّ.

**دەرازینک** (باد.): ئاستانەی دەرگا.

**دەراشۆ** (ئەردە.): ژنی بێ شەرم و حیز.

**دەراڤ** (باک.): دەراو، تەنکاو، بووار، ئەز د دەراڤەکی تەنگ دەمام: مـن لە دەراوێکی تەنگە بەر دامام. پارە، پووڵ، دراو.

**دەراقۆک** (باک.): دەرابە، دەراو، تارمەی کەناری پلیکان و قەراخ سەربانییە لەدار یا لەئاسن دروست دەکرێ.

**دەراقێن** (باک.): دەراوێژتن، فڕێدان، وەدەرنان.

**دەرامەت**: داهات، قازانج، سوود، دەستکەوتێکە گوزەرانی پێ بکرێ. (باک.) هەجەل، سەوزی، سەوزەوات.

**دەرامەد**: دەرامەت، سەرەتا.

**دەران** (کە.): دوورکەوتنەوە.

**دەرانە، دەر** (فە.): دەرک، دەرگا.

**دەراندن** (کە.): دوورخستنەوە، دەرکردن.

**دەرانین**: دەرهێنان، دەرهاووردن، پێی خوەژێ ــ: خۆکێشانەوە دوواوە.

**دەراو**: دەرگای ئاوێ، شوێنێکە لەقەراخ ئاوان کە مرۆ بتوانێ بگاتە سەراوێ، دەراقۆک، (خۆ.) شوێنێکە لەقەراخ شەلەگە ئاوان ژنان جلکی لێ دەشۆن. (باک.) شێوە، دووزان، چەم، دەرە. ــ ێ فەرمانی: شێوەی فەرمان. ــ ێ هەکینی: شێوەی مەرجی. ــ ێ پێرکەری: شێوەی ڕابەری. ــ ێ دڤێتینی: شێوەی بکەر.

**دەراوسێ**: دراوسێ، هاوسێ، هاوسا، هامسا.

**دەراوسێیەتی**: هاوساییەتی.

**دەراوسێیی**: هاوسایی.

**دەراووردن** (فە.): دەرکردن، بردنەدەر.

**دەرە**: تەنگەبەر، تەنگە، خانۆک، دۆڵ، شیو، ناوشیوی قووڵ، چۆم، ڕووبار، (خۆ.) هەرزنەگەورە. دەربەند، دەروەند. دۆڵ.

**دەرەبەگ**: هەرکەسە بۆخۆی. ــ ی: هەرکەسە بۆخۆیی، تێکچوونی ئاسوودەیی وولاتە بەهۆی زۆرداری ئاغا و دەستدرێژانەوە، خانخانی.

**دەرەبەگێتی**: خانخانێتی.

**دەرەبۆڵە** (بابا.): بۆڵمازوو (جوورە ترێیەکی گلووی گەورە و خڕ و سوورە).

**دەرەتان**: گوشادی، گونجایش، کەوشەن، دەرفەت، پەنا، پەسیو، ڕێگای ڕزگاری، ڕزگارگە، بێ دەرەتان: بێ پەنا، بێ ــ ە.

**دەرەجە**: جگەر خووینی لای وایە کەکوردییە و لەدەرگە وەرگیراوە کە مەبەس لە پایەوپلەیە.

**دەرەڕە** (هەورا.): باخی ناوچەم و دۆڵێکە کە کەوتبێتە لای خووارەوە.

**دەرەدووا** (ئەردە.): تەرە دووا.

**دەرەز**: درز، قەڵشتێکی باریکە.

**دەرەقەت**: وێران، بار، سەردەست، شیان، سەر، دەسەلات، باشار، ــ هاتن: سەردەست کرن، پێ وێران، باشارکردن، بارېردن، پێ وەستان، دەرەقەت ئامان، بڕ پێ بردن، (دەر.) پەیوبریستن، ــ ی ئەو کابرایە یا ئەو کارە نایەم.

**دەرەقەت ئامان** (هەورا.): دەرەقەت هاتن.

**دەرەقەتهاتن**: لەڕاو دەرهاتن، باشارکردن، چارەکردن.

**دەرەک**: جێگای نەزانراو.

**دەرەکووژنەو** (ئەردە.): سەرپۆش، دەمەوانە، زارپۆش.

**دەرەکی**: گیانداریکە کە بێگانەبێ لەناو ئەو کۆمەڵەدا کە تێیدا دەژی.

**دەرەگ** (ئەردە.): بیژوو، زۆڵ، قومەزە.

**دەرەگە** (موک.): بەندەر.

**دەرەگۆژنەو**: سەر پۆشی کووپەڵە و ئیتر، دەرخۆنە.

**دەرەلنگ** (هەورا.): دەلینگ، کونی خووارەوەی دەرپێ و پانتۆڵ و ڕانک و ئیترە کەپێی تێ هەڵدەکێشرێ.

**دەرەنگ** (باک.، زا.): درەنگ، دێر.

**دەرەنگهێل** (باک.): دوواخەر، وەدرەنگ خەر.

**دەرەنگی** (باک.): درەنگی.

**دەرەو** (باک.): درۆ، دەرەوە. (ئەردە.) دەرەوە.

**دەرەوە**: دەر، دەشت، چۆل، دەرڤە، هەندەران، دیوی ئاشکرا و بینراو (واژی ژوورەوە).

**دەرەوچین** (باک.): درۆزن.

**دەرەوروویین** (ئەردە.): چوونەدەرەوە.

**دەرەووری** (هەورا.): باخی ناوچەم و دۆڵێکە، کە کەوتبێتە لای ژووررەوو.

**دەرەوسۆر** (باک.): خەنەیی، سوورخون.

**دەرەوکەفتن** (ئەردە.): دەرکەوتن، ئاشکرابوون.

**دەرەوکێر** (باک.): درۆزن.

**دەرەووین** (باک.): درۆزن.

**دەرەووینۆ** (هەورا.): درۆزن.

**دەرب** (باک.): نۆبە، نەورە. بەخت، ناوچاوان، (گەر.، هەو.) بەڵ، میوەیێکە ڕووکاری دەرەوەی ساخ و ناویشی ڕزی بێ. بۆ مرۆیانیش بەکار دەبرێ.

**دەربات** (زا.): هاوشان لە هێز و تووانادا.

**دەرباخەڵ** (ڕۆژ.): باخەڵ، باغەڵ.

**دەربار**: سەراپەردە، بارەگا. دەربارە.

**دەربارە** (ڕۆژ.): لەڕاست، لەبارەی، لەلایەن.

**دەرباز**: ڕزگار. ــ بوون: پەڕینەوە، دەرچوون لە تەنگانە و گێچەڵان یا لە ئاوان و شووێنان، ڕزگاربوون. ــ کردن: پەڕاندنەوە، ڕزگارکردن.

**دەربازە** (هەورا.): داڵان.

**دەربازگە**: ڕزگارگە، شووێنێکە مرۆی لێ دەرباز و ڕزگاربێ.

**دەربازۆک** (باک.): بازگە، جێگایەکە مرۆ بەبازدان بتوانێ بەسەریدا بپەڕێتەوە.

**دەرباس**: دەرباز.

**دەرباسبوون**: دەربازبوون، ڕزگاربوون، تێ پەڕین، پەڕینەوە.

**دەرباسکردن**: دەربازکردن، ڕزگارکردن، تێپەڕاندن.

**دەربان**: دەرکەوان.

**دەربایست**: دەربەست، باکدار. ــ ی: دەربەستی، باکداری.

**دەربەدەر**: شلەودەر، ئەودالّ، هەڵتە، وێڵ، هەڵوەدا، ئاوارە، ڕەهەندە، سرگوم، سەرگوم، هەتەر، سەرگەردان. ــ بوون: ئاوارەبوون. ــ کردن: ئاوارەکردن. ــ ی: ئەودالّی، ئاوارەیی، هەتەرەیی.

**دەربەس**: دەربەست. تێکرا، گشتی، هەمووی، سەرجەم، دەربەسە.

**دەربەسە** (ئەردە.): دەربەست.

**دەربەست:** کەسێکە بە تەنگ چتێکەوە بێت. گشتی، هەمووی، سەرجەم، دەربەسە. (باک.) دەربەند، مشهەت، تەنگاو، بەتەنگەوە، بەباک، پەک، دەروەند. ــ بوون: بەتەنگەوەبوون، ژخەوە را کرن بار. ــ نیە: بێ باکە، باکی نیە، پەکی نیە.

**دەربەستە:** خانوێکە بە تەواوەتی بەکرێ بدرێ. دەربایست، دەربەست، بەتەنگەوە. ــ یی: دەربایستی.

**دەربەن** (هەورا.): دەربەند، (ئەردە.) قوڵفە و هەنگڵی چتی.

**دەربەنجەڵە:** دەرمەنجەڵە، چەپەر.

**دەربەند:** دەربەست، (باک.) مشهەت، تەنگاو، بەتەنگەوە، بەباک، پەک، دەربایست. خرتەنگ، دەروەند، گەروویەکە کە بەنێوانی دووگرد یا دووکێواندا تێکشێ و ڕێگایەکیش کە بە شوێنێکی تەنگەبەردا بڕوات ــ ی پێدەڵێن، سترینگەهە. تەنگە بەرەیێکی خاک و ووشکانییە کە لەنێو دووئاواندا وەتەنگ هەڵاتبێ یا دوو کێواندا. دەربەندی تیرەیێکە وێدەچێ لە خێڵی مام کوڕان و زەنگەنە بن، سێ دێیان هەیە لەلای کۆیە کە ئەمانەن: ئۆمەرگونبەت. سێگردکان. کانی لەلە، ئەم دێیانە ڕێگای شەش کەژمێران بە پێیان لەشاری کۆیە دوورن، هەندێکیش لەلایان وایە کە دەربەندی لە تیرەی شێخ بوزەینیانە کەلەو بەری بادینانیش هەن، بەڵان ئەوەی کە هیچ گومانی تێدا نەبێ هەستیاری پایە بەرز حاجی قادری کۆیی، کۆیی نەبووە و دەربەندییە.

**دەربردن:** دەرەقەتهاتن، ڕزگاربوون، ژیان، قوتاربوون، هەڵکردن، گوزەرانکردن، دەربوواردن. درکاندنی چتێک کە لەدڵدا شاردرابێتەوە.

**دەربڕین:** درکاندن، دەرخستن، ئاشکراکردنی چتێک کە لە دڵتدا شاردبێتەوە. دەنگ بڵندکردن.

**دەربست** (باک.): دەربەستە.

**دەربستان** (باک.): مێوبڕ.

**دەربک** (باک.): شەمچە، لێخڕێنە، (زا.) دارێکی گچکەیە کولۆرە بارووتی تێدەکرێ بۆ هەڵگرتن.

**دەربوواردن:** هەڵبوواردن، دەربردن و فڕێدانی چتێک لەناو چەند چتێکی تردا: لە نووسینەکەت دێڕێکت دەربوواردوە.

**دەربوون:** چوونەدەر، دەرکەوتن، وەدیارکەوتن. دەربوونی برین و ئاوە لە بوونی برین و قوونێر و چتی تر و فیچقە بەستنی خوێن و کێم و هەوا.

**دەربوونە:** کۆڵانێکی تەنگەبەرە کە دەرنەچێ.

**دەربێن** (ئەردە.): دەم بێن بۆ جەواڵ و خیگە.

**دەربیجە:** ڕۆچنە لە دەرگا و پەنجەرەدا.*

**دەرپ** (باک.): تەورو.

**دەرپا** (فە.، شوا.): دەرپێ، (فە.) پێشدەرگا، بەردەرگانە. (فە.): دەلینگ.

**دەرپاچە** (ئەردە.): دەرەلنگ، دەلینگ.

**دەرپەراندن:** ڕاپەراندن، وەدەرنان، دەرکردن، دوورخستنەوەی چتێک لە شوێنێکیدا بەزۆر. زەقکردنەوەی چاو یا قوتکردنەوەی ئەندامێکی لەش. سا چاو بێ یا مست و شوێنێکی تربێ.

**دەرپەرانن:** دەرپەراندن.

**دەرپەڕێن:** ڕاپەڕێن، چوونەدەر.

**دەرپەڕین:** ڕاپەڕین، غاردان بەتاو، بەلقاندن، دەرچوونی چتێک لە شوێنێک، لەپڕێکا چوونەدەرەوە، دەرکەوتن.

**دەرپەڕیو:** ڕاپەڕیو، چتێکە لە شوێنێکی دەرچوو بێ.

**دەرپۆشک** (باک.): سەرقاب، سەرپۆش.

**دەرپۆقین:** دەرپەڕین و هاتنەدەرەوەی گلێنەی چاو.

**دەرپۆقیو** (باد.): گلێنەی چاوێکە کە دەرپەڕیبێ.

**دەرپێ:** (کە.) دامانپۆش، ساتان، پابەرێ، (هەورا.) پاوەرێ، دەرپێ بۆ نێرینانە بەڵان بۆ ئافرەتان ئاوالکراس بەکاردەبرێت.

**دەرتەقێن:** ئاسنێکە بەدەرگاوە دەخرێ بۆ لە دەرکە دانێ، دەرکوت، دەرگاکوت.

**دەرتەنوور:** دەرخۆنەی سەر تەندوورێ.

**دەرجاو** (زا.): دەستەسڕ، (باک.) خاولی.

**دەرچەراندن:** دەرکردن، وەدەرنان.

**دەرچک** (باک.): ئاستانە، پێشدەرگانە، جێگای قۆندرە لێداکەندن، (زا.) ژێردەرگا.

**دەرچوو:** دەربازبوو، لە جێ چوو، لەگەچوو، دەرهاتوو، لەترس دەرچوو.

**دەرچوون:** دەرباز بوون بەتوندوتۆڵی. تەقینی چەک لە خۆیەوە. چوونەدەر، دەرهاتن، دەرکەوتن. پێ یا دەست لە جێ چوون، لەگەچوون. پوختە و قاڵبوونی هەندێ چت یا مرۆ. هەڵاتن، تێ تەقاندن، تەقین، ڕزگاربوون، قوتاربوون، لەکێشە و رووشە و گێچەڵ و کاروباران. چوونەدەر، وەدەرکەوتن، دەرکەفتن، (هەورا.) بەرشیەی، دابڕان، ژێ بوون. ڕووان، سەرهێنانەدەرێی سەوزایی.

**دەرچینە:** قەرتاڵە، تریان.*

**دەرحەسین** (باد.): خلیسکان.

**دەرخ** (باک.): پنچک، داری کورت، چکۆڵەی چەقیو.

**دەرخەر:** وەدەرخەر، دەرمانێکی گیراوەوەیە لەوێنەگەرێتیدا کە لە پێشدا وێنەی تێدەخرێ و دەری دەخات، واتە وێنەکەی دەردەخات، خۆدەرخەر: ئەوکەسەیە بەخۆی دەفشێ و خۆی ڕادەنێ.

**دەرخەل** (گەر.): ساختەکار، فێڵباز.

**دەرخستن:** ئاشکراکردن، ساخکردنەوەی چتێک. دەربڕین، دەرێخستن، خستنەدەشت، ئاشکراکردن، بەرزانی، (باک.) ووناراو، وەرزین، هەڵڕشتن. فڕێ دان، دووراوێژتن. ــ ی ئاوو چتی تر: دەردان، هەڵێنجان، وەدەرنان.

**دەرخک** (باک.): قەڵەم، پەل، داری چکۆڵە.

**دەرخووارد:** هاوشان و هاولف: وەکوو دەڵێن زارا ــ ی دارا نیە. هاوشان، هاوزێ، هاولف، دەرخورد.

**دەرخوواردان:** پێ خواردنی چتێک بە یەکێک بەزۆر، وورده ووردە تێوەردان و تێکەڵکردنی چتێکی وورد لەگەڵ چتێکی شل، ئاردەکەی دەرخوواردی سەمەنیەکەدا.

**دەرخووانە** (کە.): پنە.

**دەرخورد:** هاوشان، هاوزێ، هاولف، دەرخواورد، دارا ـــ ی سەرهەنگی نیە.

**دەرخوون** (باک.): دەرخۆنە.

**دەرخووین** (باک.): دەرخۆنە.

**دەرخووینک:** دەرخۆنەی دار.

**دەرد:** ژان، داخ، دەر، ئازار، نەخۆشی، ئێش، پەرۆش، دژواری، بەدبەختی، ـــ کێشان: ئازاردیتن، ـــ ێ تەبینم: یا خوا تۆ بەداخەوە نەبینم. ـــ ی بێ دەرمان: (باک.) کوڤان، نەخۆشی کوژندە، ـــ ی دڵ، ـــ ی چیکڵدانە: ناڤێش.

**دەردان:** بۆگەل و گشتی دەردان بەکار دەبرێت، پەیدا بوونی ئاولە و سووریژە و چتی تر لە لەشی زیندەواران. دەلاندنی ئاو لە کوویە و چتی گلینە. ئاوەردان: ئاوهەڵێنجان لەحەوز یا جێگایانی تر، پاک کردنەوە، دەرکردنی لق و پۆپی سەوزایی، میوەکە چرۆی دەرداوە. خاوێنکردنەوەی بیرو چاڵ و چالاوان و شوێنی تر.

**دەردانک** (باک.): جۆرێکە لەپارچە و تنراو پەنیری تێدا ووشک دەکرێتەوە.

**دەرداوی:** چتێکە کەدەردێکی پێوەبێ.

**دەردەباریکە:** ئاز، نەخۆشی سیل، ئازاری سی، ئازارەباریکە، دیق.

**دەردەپیسە:** مەو، جوورە قوونێرێکی پرژان و ژووارە زۆرتر لە قامکی مرۆڤان دێت، دەردێکی بەژان و پیسە، کولکی سۆتنێ، کولکە پیرۆزە.

**دەردەجمگە:** ژانی جومگە، جمگەئێشە.

**دەردەدار:** دەخەزدار، دەردمەند، دەردناک، قەفقەفە. ـــ ی: دەخەزداری، دەردمەندی.

**دەردەسار:** دەردەسەر. ـــ ی: دەردەسەری، ئازار.

**دەردەسەر:** دەردەسار. ـــ ی: دەردەساری، ئازار، چەرمەسەری، مەخسەرە، بێنەو بەستە، سەرئێشە، کوێرەوەری، هاتووچۆ.

**دەردەست** (باک.): ئامادە، ئەوەیە لەژێر دەستدابێ.

**دەردەستبوون** (باک.): ئامادەبوون، هاتنەژێردەستی چتێک.

**دەردەستکردن:** ئامادەکردن، هێنانە ژێردەستی چتێک.

**دەردەکۆپان** (هەورا.): گووێ ڕەپە، ملەخرە، دەردێکی گرانە تووشی منالٚ دەبێ لەتاوان کەف دەچێنی و چنک قژدەکاتەوە.

**دەردەکورتان** (خۆ.، کۆ.): فێ، خوو، گەشکە.

**دەردەگا:** دەردێکە هەر ڕەشەولاخێک بیگرێ لەگەڵ ڕیخی کوتە گۆشت دێتەدەرێ.

**دەردەم** (هەورا.، ژا.): دەست بەجێ.

**دەردەمردە:** گیانداری دەغەزداری دەردەدار.

**دەردەنگ** (باک.): دەنگدانەوە.

**دەردەوشارەگی** (هەورا.): ژانی شارەگ.

**دەرد دامرکان:** کفت و کۆی ئێش و ئازارنەمان.

**دەردامرکاندن:** کفت و کۆی دەرد و ئازار لەناوبردن.

**دەرد دامرکێن:** ئارامی دەر.

**دەردمەن:** دەردمەند.

**دەردمەند:** دەردەدار. ـــ ی: دەردەداری.

**دەردمردە:** گیانداری لاوازی لەمردن. *

**دەردناک:** دەردەدار.

**دەردناکی:** دەردەداری.

**دەردۆ:** گۆرانییێکی کوردەکانی باکوورە.

**دەردۆک** (ئەردە.): دەردژنگ.

**دەردوو** (ئەردە.): دەرپێن.

**دەردووشارەگی** (هەورا.): دەردی شارەگ.

**دەردو وولکی** (هەورا.): دەردی گورچیلە.

**دەردێ** (موک.): شیناوەردی بەرمالان.

**دەردی بێ دەرمان:** دەردی کوژندە، دەردی کاری.

**دەردی دڵ:** نەخۆشی دڵ. خەم و پەژارەی دڵ و دەروون.

**دەردی دووری:** خەم وپەژارە لەبەر دووری لەکەس وکار یا ولات ودۆست.

**دەردی سەر:** ڕەنج و سەخڵەتی، سەرئێشە. ـــ ی: سەرئێشە، سەخڵەتی.

**دەردی کاری:** دەردی بێ دەرمان.

**دەرڕۆیین:** دەرکەوتن، چوونەدەرەوە.

**دەرز:** تەرک، قەڵشت، تیک، درز. (ع.) دەرس، وانە، (باک.) درز، قەڵشت.

**دەرزاندن** (باک.): ووردکردن، شکاندن، دراندن، بدەرزینە.

**دەرزە** (فە.): دەرزی. (هەورا.) کۆمەڵەیێک لە لۆ.

**دەرزەن:** دەرزن، (هەورا.) دەرزی، دەرزەن (کوردی نیە) مەبەس لە دەستەیێکی دوازدە دانەییە.

**دەرزدان:** قەڵشت بوون، درزدان.

**دەرزکردن:** درکیان، ئاشکرابوون.

**دەرزن** (دەر.): دەرزی.

**دەرزندان** (دەر.): دەرزیدان.

**دەرزی:** ئاسنێکی باریکی نووک تیژە و کوندارە بۆ دروومان، (هەورا.) چەنی، دەرزە، (فە.، دەر.) دەرزن، مرازێکی دروومانییە، کونی دەرزیی: سۆما. جوورە خشڵێکی ئافرەتانەیە. مەبەس لە ئانپۆڵە. دەرزی پینەچییان: دلیوان. (باک.) دراو، قەڵەشاو.

دەرزی

**دەرزی ئاژن:** بەدەرزی کوتانی شوێنێک لە لەش.

**دەرزی بەرکۆژە** (موک.): دەرزیلەیێکی سەرخڕە سینگی سیخمە و کراس و کەوای ژنانی پێ قایم دەکرێ.

**دەرزی دان:** چەندان، (هەورا.) چەنیدان، (دەر.) دەرزندان، (باک.) دەرزیدانک، (هەورا.) چەنیدان، کوردەرزی، چتێکی کولۆری باریکە دەرزی تێدەخرێ.

**دەرزی دانە:** (دەر.) درزیلە، (خۆ.) مام دەرزیلە، (باد.) پێ لەقلەق، گیا، گیایەکە لەسەر لقەکانی گوڵی سووری وورد دێنێ لایەکی لاسکە کانیشی سوورە و لایەکەی تری شینە، کە گوڵەکە وەری کیفی گوڵەکە وێک دێتەوە چتێکی باریک و درێژی وەکو تەبەنەی دەردەکات.

**دەرزیدانک** (باک.): دەرزی دان.

**دەرزیلـە:** جـووره دەرزییێکـە لەنێخـە و بـەرۆک دەدرێ، کووهـەدەرزی. دەرزیلۆکە.

**دەرزی لەرزانـە** (ئـەردە.): شانەییێکە لەسەر دەدرێ و مووی سـەر بـەوی رێک دەخرێ.

**دەرزیلۆکە:** گیایەکی بەهارییە بەرێکی دێنی وەکوو دەرزی وایە، دەرزیلە.

**دەرزین** (بـاک.): شـکان، دارِزان، قەڵشـان، بـدەرزە: بـرزێ، بشـکێ، بقەڵشێ.

**دەرزی وەشاندن:** دەرزی لێدان، شرینقەو ئەنپۆل لێدان.

**دەرس** (ع.): وانە.

**دەرسۆک** (باد.): دەستەسر.

**دەرشۆ** (باک.): کووپەڵە، (زا.) شاڵی کاسەو کەوچکان.

**دەرف** (باک.): سـەرِا، سـەربارە. مرۆڤایـەتی، جووامێری، بێ ـــ: بـێ ویژدان، نامرۆ.

**دەرفە:** دەرف.

**دەرفـەت:** (بـاک.) دەلیـڤ، کـەلێن، کەلەبـەر، هەڵکـەوت، بەرکـەڤ، (باک.) پێلیسـک. کـەیس، چەخش، مـەیدان، هـەل. ـــ بوون: پێکران، پەرژان، لەدەستهاتن، بە ـــ گەیشتن: پێراگەیشتن، پێگەیشتن.

**دەرفرتاندن:** دەرپەراندن، دەرهێنان.

**دەرفـزە** (مـوک.): پسـکە، دەردێکـە وەکـوو هەلاّمـەت تووشـی وولاّخ و مالاّتان دێت، کە ڤالۆری گیای دەرفزەی لەملی کەن چاک دەبێتەوە.

**دەرفانگ** (باک.): دەرخۆنە، سەرپۆش.

**دەرڤە** (باک.، زا.): دەرەوە، چوونەدەرەوەی چت لە شوێنێک.

**دەرڤاچ** (کەل.): دەلینگ. دەرڤاچێ(هەورا.): دەلینگ.

**دەرڤەل** (باک.): پارچە، کوت. نوختە، جێگا.

**دەرڤیتک** (باک.): ئێسکی سەر کلاّوەی ئەژنۆیە، کەشکەژنۆ.

**دەرڤیل** (باک.): پایە، پشتیوان، چاکڵ.

**دەرک:** دەر، دەری، (هـەورا.) بـەر، بـەرە، (فـە.) درانـە، دەرگـە، دەرگا، دەرکە، ـــ پێوەدان: دەر گالێکنان، (کە.) زارکی دۆدانە و ئیترە.

**دەرکە:** دەرگا، دەرک.

**دەرکەتن** (باک.): دەرکەوتن، وەدەرکەوتن، دەرگەڤە.

**دەرکەفتە:** گیانداری تەرە و توونابوو، ئاوارە، دەربەدەر.

**دەرکەفتن:** دەرکەوتن، تەرەبوون. چوونەدەرەوە، وەدەرکەوتن.

**دەرکەنار:** گۆشـەگیر، نـەدیو، پـەنهان، ـــ کردن: شـاردنەوە، ـــ گرتـن. مـەردومی گۆشـەگیر، چـەند دێرێکـی کورتـە کـە نووسـرابێ لەلایـەن گەورەیەکی دەوڵەتیەوە. ـــ ی: گۆشەگیری.

**دەرکەوان:** دەرکەڤان، (باد.) دەرگەهڤان، دەرگەوان. ـــ ی: دەرگەهڤانی

**دەرکەوتە:** دەرکەوتوو.

**دەرکـەوتن:** دەرهـاتن، هاتنـەدەر، وەدەرکـەوتن، دەرچوون، ئاشـکرابوون، دەرکەتن، چوونەدەرەوە لە شوێنێک. ئاشکرابوون، خویابوون، سـەر وەدەر نان.

**دەرکەوتوو:** دیار، ئاشکرا، کەسێکە چووبێتە دەرەوە.

**دەرکران:** ڕاونران، دوورکەوتنەوە، ڤەورین، ڤەوتین، خورمین.

**دەرکـردە:** ئـەو نووسـراوانەیە کـە ژمارەیـەکی تایبـەتی دەنـێردرێ بـۆ وولاّتێکی تر یا لە فرمانگەییێکەوە دەنێردرێ بۆ فەرمانگەیەکی تر. ئەو بەرروو بوومەیەکە لە وولاّتێکەوە بۆ وولاّتێکی تر دەنێردرێ بە بازرگانی.

**دەرکردن:** کردنەدەر، کرنـدەر، بدەرکرن، وەدەرنـان، جـەلیاندن، دەراندن، دەرپەڕاندن، دەرکرن، تۆڕاندن، دوورخستنەوە، دەرخستن. لەدەستدان، لـە دەستچوواندن، پاسدان، ڤەوراندن، دەربـازکردنی چتێکی قاچاخ، ئاوڵـە، سوورێژە، سەر لێ ـــ: لێزانین، دەرهێنان، زانین، دەر ووردن. ـــ ی برین: زارکردنەوەی برین. جیا کرانەوەی مووچە خۆر لەکارو بارەکـەی.وەدەرنان، ڕاونان، کردنەدەرەوە. سەرلێ دەرکردن، تێگەیشتن، وێکەوتن.

**دەرکۆدەرکۆ** (گەر.): (هەو.) دەرۆزەکەر، (هەورا.) لەتەچن.

**دەرکۆدەرکۆیی** (گەر.): دەرۆزەکەری.

**دەرکوت:** دەرتەڤێن.

**دەرکوودوو:** دەرماڵ یا خووا لە هیچ ـــ یێکا نەبێ.

**دەرکێشان:** هێنانە دەرەوەی چتێک لەچتێکی تر بەزۆر، دەرهاووردن.

**دەرگ** (شەبە.): کۆ، شیو، ـــ کردن: شیوکردن.

**دەرگـا:** (هـەورا.) بـەرە، بـەر، دەر، دەرگـە، دەرک، دەرکـە، ـــ کردنـەوە: دانلا. زاری هەمووکون و دەفرێک.

**دەرگـا ئـاخن:** دەرگـاخن، پڕکردنـی دەفرێـک لـەچتێک و ئـاخنینی تـا دەرگایەکـەی، کـادێن پڕکـرێ تـا دەرگایەکـەی ـــ ی پێدەڵێـن. گولبێنـە، تۆپەدانەیێکە کونی کەندوو و تەندووری پێ دەئاخنرێ.

**دەرگابوون:** دەر بوونی برین لە خۆیەوە.

**دەرگابێن:** بەنێکە دەرگای هەمبانە و چتی تری پێ دەبەسترێ.

**دەرگاژەنانە:** دەرگوشادانە.

**دەرگاکەل:** دەرگا.

**دەرگاکردن:** دەرکە دروست کردن. کردنەوەی زاری برین.

**دەرگانە:** دەرکە، دەرک. مز و نرخی دەرکێ.

**دەرگە:** دەرکە، دەرگا، دەر، جێگای دەرک.

**دەرگەڤان** (باک.): دەرکەوان.

**دەرگەوان:** (باک.) دەرکەڤان، دەرکەوان.

**دەرگەهـ** (باک.): دەرکە.

**دەرگەهڤان** (باک.): دەرکەوان. ـــ ی (باک.): دەرکەوانی.

**دەرگستی** (باک.): دەزگیران.

**دەرگڤانک** (با.): سەرڤاپی کووپەو گۆزە.

**دەرگووش** (باک.): لانک، بێشکە.

**دەرگوشادانە** (دا.): دەرگاژەنانە.

**دەرگوشاندن** (باک.): ڕاژاندنی لانکە و ئیتر.

**دەرگووشدەم** (باک.): فریودەر.

**دەرگوشین** (باک.): ڕاژانی لانک و ئیتر.

**دەرگێڵ** (هەورا.): گەرۆک.

**دەرگیل** (باک.): دەرکەیەکە لە چەشنی پەنجەرە دایە، (باد.) چەپەر.

**دەرلنگ** (باک. ، کە.): دەلینگ.

**دەرمال** (باک.): کارەکەر، قەرەواش.

**دەرماڵ** (ئەردە.): دادگا، سەرا. (دەر.) پێشدەرگا، پێشدەرگانە، خانووبەرە.

**دەرماڵە** (باک.): وولاخ و ئاژاڵی دابەستراو، دابەستە.

**دەرماڵکری** (باک.): وولاخ و ئاژاڵی دابەستراو.

**دەرماڵی**: کار و بەرخێک و گوێلکێک بەهۆی درەنگ لەدایک بوونیەوە لە ناو ماڵا بەخێوبکرێ، خانەزا و نەکرابنە ناو کارەگەل یا بەرخەگەل یان گوێلکەگەلانەوە.

**دەرمان**: داروو، چتێکە بۆ چابوونەوە بدرێ بە نەخۆش، باروت، ـــ کردن: تیمارکردن، ـــ ی تفەنگێ: باروت، ـــ ی زگچوونێ: دەرمانی ڕەوانی، ـــ ێ کەوێ: دەرمانی خوێن راوەستاندنێ، ـــ ی گەرم: ئیسیوەت.

**دەرمان ئەرمانای** (هەورا.): چارەنامە.

**دەرماناوی** (هەورا.): دەرماناو.

**دەرمانچا** (هەو.): تۆچا، چای ووشک. ـــ یی (هەو.): تۆچا، چای ووشک.

**دەرمانخانە**: کۆگای دەرمان.

**دەرمانخووار**: دەرمانخوارد.

**دەرمانخووارد**: کەسێک ژەهری درابێتێ.

**دەرمانخوواردن**: دەرمان دەر خوواردان.

**دەرمانخوواردکردن**: ژەهردان بەکەسێک بۆ کوژتنی.

**دەرمانخوواز**: چاوێکە کە بێشێ و پێویستی بەدەرمان هەبێ. ـــ ی: پێداویستی بەدەرمان.

**دەرماندار**: نەخۆشەوان. ـــ ی: نەخۆشەوانی.

**دەرماندان**: سنووقی شووشەی دەرمان فرۆش.*

**دەرماندراو**: دەرمانخوارد.

**دەرماندراوکردن**: دەرمانخواردکردن.

**دەرمانساز**: دەرمان چێکەر، دەرمانفرۆش، دەرمانگەر.

**دەرمانسازخانە**: دەرمانخانە، دەرمانگا.*

**دەرمانسازی**: دەرمان چێکەری، دەرمانفرۆشی، دەرمانگەری.

**دەرمان شل کەردەیۆ** (هەورا.): دەرمان شل کردنەوە.

**دەرمانفرۆش**: کەسێکە دەرمانی بفرۆشی.

**دەرمانک** (باد.): دەرمانگەرم، ئیسوەت، ئاڵەت.

**دەرمانکەر**: دەرمانکار، پزیشک.

**دەرمانکردن**: تیمار و چارەی نەخۆش و برینداران کردن.

**دەرمانکوت**: بە برینێک دەکوترێ کە زۆر زووزوو لەسەر یەکتری دەرمان کرێ یا چاوێکی کە زۆری دەرمان تێکرێ ـــ ی پێدەڵێن. کەسێکە پیشەی هەر باروت کوتان بێ.

**دەرمانگە**: دەرمانخانە، شوێنێکە دەرمانی تێدا دەفرۆشرێ.

**دەرمانگەر**: دەرمانساز، کەسێکە دەرمانی بگرێتەوە.

**دەرمانگەرم**: (هەورا.) ئاڵەت، (باد.) دەرمانک، ئیسیوەت، (هەو.) بیبار.

**دەرمانگەری**: دەرمانسازی، دەرمانفرۆشی، دەرمانچێکەری، خەریک بوون بە دەرمانگرتنەوە.

**دەرمان وورەش** (هەورا.): دەرمانفرۆش. ـــ خانە (هەورا.): دەرمانخانە.

**دەرمانۆشلۆکەردەی** (هەورا.): دەرمانی شل کردنەوە.

**دەرمانۆگیریای** (هەورا.): دەرمانی گیری.

**دەرمانی خۆش بوونەوە** (شفا): نۆژداری.

**دەرمانی ڕەوانی**: دەرمانی زکچووانێ.

**دەرمانی شل کەردەیۆ** (هەورا.): دەرمانی شل کردنەوە.

**دەرمانی گیر**: دەرمانی گیرو گرفت.

**دەرمانی هەراز**: دەرمانی ڕشانەوە، ڕشێنەوە.

**دەرمەجێڵ** (ئەردە.): دەرمەنجەڵ.

**دەرمەجێڵە** (ئەردە.): دەرمەنجەڵە.

**دەرمەچار** (فە.): سنوور.

**دەرمەشک** (باد.): چەرمێکە دەرگا و زاری مەشکەی پێ دەبەسترێ. ڕەحەتی.

**دەرمەنە**: داماو، تێماو.

**دەرمەنجەڵە**: چەپەر.

**دەرمەنجلە** (ئەردە.): دەرمەنجەڵە.

**دەرمۆر** (کە.): سەرمۆر. ـــ کردن: سەرمۆرکردن.

**دەرمێو**: مێوی هەنگوینی.

**دەرناگە** (هەورا.): گرووی منداڵان و ئیتر.

**دەرنەبەر**: بەرنەگر، کەم توانا.

**دەرنەبردن**: بێ توانایی، نەتووانین.

**دەرنەقۆت** (باک.): وەرگێران، ڕژتن. ـــ بوون. ـــ کرن.

**دەرنەکەفک** (باک.): مەشکە و کوندەیێکی بێ کون و کیپە.

**دەرنەکردن**: وەدەرنەنان. سەرلێ دەرنەکردن، هیچ لێ نەزانین.

**دەرنەگە** (باک.): گرووی منداڵان و ئیتر.

**دەرنخوون**: دەرخۆنەیێکی قۆڵە کە لەسەر تەندوریێ سەرەونخوون دادەنێن. (ئەردە.) دەمەونخوون.

**دەرنخووین** (باک.): قلپ، سەرنخوون. ـــ بوون: سەرنخوون بوونەوە. ـــ کرن: سەرنخوونکردنەوە.

**دەرنگ** (باک.): دەڤلنگ، دەلینگ.

**دەرۆ** (هەورا.): چەم، ڕووباری بەداروبار.

**دەروو**: دەرک، ـــ ی بەخێر: دەرگای خێر.

**دەروار** (باک.): دەوار، ئەسپ و ئێستر و ماین و کەر.

**دەروازە**: دەرگای گەورەی دووتایی حەوش.

**دەروازەوان**: دەرکەوان.

**دەروازەوانی:** لۆک، لۆپ، هافرتی، دەرکەوانی.

**دەروان:** دەرکەوان.

**دەروانک:** (کە.) دەروانکە.

**دەروانی:** دەرکەوانی.

**دەروەچار** (فە.): سنوور.

**دەروەن** (ئەردە.): دەروەند، دەربەند و دەرە، دەرە. (ئەردە.) دەربەند، دەراو، دۆڵ.

**دەروەنجەڵە** (ئەردە.): دەرمەنجەڵە.

**دەروەند:** دەربەند.

**دەرەوڕۆیین:** بۆ دەرەوە ڕۆیشتن.

**دەرەوکەفتن:** دەرکەوتن، چوونە دەر.

**دەرودەشت:** چۆڵ وسارا، بەدەر لە ئاوایی.*

**دەرۆر** (هەورا.): هاتوو چۆکردن بەناو شیوەردا.

**دەرۆزان:** خاکەڕۆ.

**دەرۆزە:** دەریۆزە، (باک.) پارس، (گەر.) دەرکۆدەرکۆیی، هەژاری، (هەورا.) لەتەچنی.

**دەرۆزەکەر:** سوواڵکەر، خووازۆک، خووازخووازۆک، دەرکۆدەرکۆ، (گەر.) چنک چنک، خووازەڵۆک، پارساک، پارسەک، پارسکەر. ـــ ی: سوواڵکەری.

**دەرۆزەیی:** هەژاری، بەدبەختی، پارسەکی، خووازەکاری.

**دەرۆم** (ئەردە.): ژەقنە.

**دەروو:** دەربەند، دەرەتان، خووا دەرووت لێ بکاتەوە.

**دەرووبان:** دەروبەری خانوو (ئەخۆشەکە دەرووبان دەکا)، دەرک و بان.

**دەرووبانکردن:** دەرودەشتکردن.

**دەرودەشتکردن:** هاتوچۆ کردنی دەشت و دەر، فیسارەکەس هاتوچۆی دەرودەشت دەکات.

**دەرودراوسێ:** دراوسێی نزیکی دەوروبەری مرۆ.

**دەروودوو:** دەرووبان.

**دەرووردن** (کە.): دەرکردن، لێ زانین، تووانین.

**دەرودۆر:** ژێردەستە. کەل و پەلی ناوماڵ.

**دەرووژوورکردن:** هاتوچۆی دەرەوە و ژوورەوە کردن، نەخۆشەکە یا منداڵەکە دەروژووری دەکات.

**دەروون:** دوڕە، هەندوڕ، ناوی لەش یا هی خانوو و ئیتر، دیوی ناوەوەی بە تاڵی لەش، ناوزگ.

**دەروونداز:** دڵدار، دڵگوشاد، دڵفراوان.

**دەرویش:** دەریۆژ ئەو کەسەیە لەبەر دەرگایان گۆرانی و هەڵبەستان دەڵێ و دەرۆزەی دەکات.

**دەرویشانە:** دەریۆژانە.

**دەرویشی:** لەبەر دەرگان گۆرانی و هەڵبەست بەدەنگ خووێندنەوە بە نیازی دەرۆزەیی.

**دەرهاتن:** سەردەرهێنان بۆ شینایی. گیان دەرهاتن، کۆتایی بەژیاندان. ـــ ی گیان: کێشران، هەڵکەنران، کنیان. هەڵاتن و دەرکەوتنی مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە. کێشیان، دەرکێشیان، بۆ تیرو خەنجەر و ئیتر. هاتنەدەرەوە، دەرکەوتن، دەرهاتنی چتێکی لەنێو چتێکی تر، گاسنە کە لەلای ئاسنگەرەکە دەرهات واتە تەواو بوو، پوختە بوون و پێگەیشتنی چتێک، لەجێ چوونی ئەندامێکی لەش، ـــ ی گیاودار: سەوزبوون.

**دەرهاتوو:** دەراتوو، دەرکەوتوو، مەردوم یا چتێکە پوختە بووبێ.

**دەرهانین:** دەرهێنان.

**دەرهاووردن:** دەرهێنان، زەوی بۆکشت و کاڵ ئامادەکردن. دەرکێشان، هەڵکێشان. کێشانی وێنە و نیگار و نەخش و ئیتر.

**دەرهاوێزران:** فرێدران، لێ جووێ کرانەوە.

**دەرهاوێزراو:** فرێدراو، چتێکە، کە لەچتێکی تر فڕێ درابێ.

**دەرهاویشتن:** دەرکردن، فرێدانی چتێک لەناو چەند چتێکی تردا.

**دەرهەم:** تێکەڵاو.

**دەرهێنان:** دەرهانین، (ڕۆژ.) دەرهاووردن، دەرێنان، دەرانین، دەرفرتاندن، (باک.) بەرهسکرن، جەلیاندن، هێنانەدەر، ئاولە چالاو ـــ : هەڵێنجان، هێلکە ـــ : هێلکە دەرهاووردن، زانین، پەی پێ بردن، سەرلێ دەرچوون، سەرلێ دەرکردن.

**دەرهێنراو:** چتێکە کە لەچتێکی تر هێنرابێتە دەرێ.

**دەرێ:** دەرەوە.

**دەریا:** ئاوێکی زۆری قووڵی وایە کەکەشتی بەسەردا بڕوات، زرێ، زەریا، زریە، دەلیا، (هەورا.) زەری، قەلزەم.

**دەریاچە:** دەلیاچە، گۆم، گۆل، زرێچە، زرێبار، پەرم.

**دەریادار:** دەریاوان، زرێدار، زرێ وان. ـــ ی: دەریاوانی، زرێداری.

**دەریاگر:** جەردەی ناودەریا. ـــ ی: جەردەیەتی ناودەریایە.

**دەریاوان:** هەڵسووڕێنەری کاروباری کەشتی و گەمێیان. ـــ ی: هەڵسووڕاندنی کاروباری کەشتی و گەمێیان.

**دەریای بێچوون:** دەریای بێ پایان.

**دەریایی:** کەسێکە، کە هەر لە دەریادا ئیش بکات، زرێ یی، زریەیی.

**دەرێخستن** (باک.): دەرخستن، دەرهێنان، ساخکردنەوە، تە ئەز دەرووین دەرێخستم: تۆ منت بەدرۆزن دەرخست، وەدرۆت خستمەوە.

**دەرێزان:** بەردەرگا.

**دەرێنان:** دەرهێنان.

**دەریی** (باک.): دەرک، دەرگا.

**دەریچە:** قاڵبێکە مۆر و کەرەستەی کانی لەزێڕ و زێو و ئیتر تێدا دادەڕژێت. دەرگا یا پەنجەرەی چکۆڵە، کون.

**دەری دەری:** کەلەن کەلەن.

**دەریزان** (باک.): ئاستانە، شوێنی کەوش لێداکەندنی.

**دەریزانک:** ئاستانە، کۆسپەی پێشدەرگا.

**دەریۆزە:** دەرۆزە.

**دەریۆزەگەڕ:** دەرۆزەکەر. ـــ ی: دەرۆزەکردن.

**دەریۆزەیی:** دەرۆزە.

**دەزەڵە** (باڵە.): ئەو تیسماڵکە باریکەیە کە لە قامکان هەڵدەبێ.

**دەزبار**: دەستبار. ــ ی: دەستباری.

**دەزبەند**: دەستبەند، (هەورا.) دەستەوانەی ژنانە.

**دەزبێلنک**: بازن، بازنە، دەسبێنک.

**دەزگ**: دەزوو، لۆکەی ڕێسراو.

دەزبێلنک

**دەزگا**: دەستگا، دەزگاوبەرە، کارخانە، (باک.) دەزگەهـ، یا چتێکی پانە لە ئاسن یا لەدار دروست دەکرێ، سندانی ئاسنگەران یا درووماني لەسەر دەکرێ.

**دەزگاگێڕ**: دەستگاگێڕ. ــ ی: دەستگاگێڕی، پیشەگەری.

**دەزگە**: دەزگا.

**دەزگەهـ** (باک.): دەزگا، کارگە.

**دەزگ بادریاگ**: دەزووی بادراو، کشتەک.

دەزگا

**دەزگ خاو**: دەزووی با نەدراو.

**دەزگر**: دەزبیران، پەڕۆی شتی گەرم پێگرتن، وردەواڵەی چەرچی.*

**دەزگرە**: (هەو.) دەستە، (باد.) پووتک، (ڕەوا.) دەستەک، دەستگرە، پاچک، پەڕۆیەکە دیزە و مەنجەڵی پێ لەسەر ئاوورگێ دادەنرێ یا دادەگیرێ.

**دەزگرتی** (باک.): (باک.) دەستگرتی، بەرچاوتەنگ.

**دەزگەهەڵکەر**: خەرەک، تەشی.

**دەزگیاو**: دەزوو نوبەتێ برینێ.

**دەزگێڕ**: فرۆشیارێکە چتی بەدەست بگێڕێ بۆ فرۆشتن.

**دەزگیر**: دەستگیر. ــ بوون: دەستکەوتن. ــ کردن: وەدەستخستن.

**دەزگیران**: دەسگیران، (باک.) دەستگیرانی، دەرگستی، خووستی، (کە.) دەزویران، نیشانی، دەزگرتی، دەستگرتە، کوڕ و کچێکی کە بۆ یەکتری نیشانە کرابن دەبنە ــ ی یەکتری. (باک.) جیازی بووکان.

**دەزگین** (باک.): جڵەو، هەوسار، دەستگیرە.

**دەزمایە**: دەستمایە.

دەزوو

**دەزوو**: (دەر.) مەچیر، (هەورا.) نەی، (باک.، هەو.) دەزی، (کە.) کەندر، دەزگ، هەودای باریکی ڕێسراوە لە لۆکە.

**دەزووران**: دەزگیران.

**دەزوولە** (شار.، هەو.): دەزووی کفن دروونێ. چتێکە وەکوو دەزوو لەکشانی چتی لینج پەیدا دەبێ.

**دەزوولەبەستن**: دەزوولەکردن.

**دەزوولەکردن**: پەیدابوونی دەزوولە لەچتی لنجەوە پەیدا دەبێ، شەربەتەکە یا دۆشاوەکە دەزوولە دەکا واتا خەست بۆتەوە.

**دەزوولکە**: دەزووی تیسماڵکی باریکی تان و پۆی پێستی لەشە.

**دەزویران** (کە.): دەزگیران.

**دەزی** (باک.، هەو.، زا.): دەزوو.

**دەزیران** (ئەردە.): دەزگیران.

**دەزیران بازی**: دەزگیران وازی، سەوداگەری.

**دەژ**: یەدەک، چتی دەست لێ نەدراو.

**دەژاندن**: داخکردنی ددانە بۆ ژانشکاندنی.

**دەس** (هەورا.، بابا.): دەست.

**دەس ئەسرپەی** (هەورا.): دەست ئەستڕین. ــ بەزاخاکردن: تەفرەدان، خڵەتاندن. (ئەردە.) نووکە، چەل. دەستە جل و بەرگ. (ئەردە.) جوور، چەشن.

**دەسا**: دەیسا، دەی، زووکە، سادەی، (کۆ.) جا، سا، دەوجا، پیا، ئیدی، ئیتر، دەجا، ووتەیەکە بەکار دێنرێ لەناوەندی دوو ووتاراندا، هۆیەتی پێشووەکەیان بۆ پاشووەکەیان دەگەیەنێ.

**دەسادەی**: دەیسا، زووکە، دەوجا، ئیتر، دەیسادەی، زووبە، پەلەبکە.

**دەسازۆ**: دەستەمۆ، دەستەسر. دەستخۆش.

**دەس ئەسڕ**: دەستە سڕ، دەسڕە.

**دەساگر** (ئەردە.): دەستەچیلە، چاوکە، ئاگرگرە.

**دەسان** (ئەردە.): داستان، دەستان. سەربردە، بەسەرهات.

**دەساندەس** (ئەردە.): بەرانبەر، دەستاودەس.

**دەساو**: دەستاو.

**دەساوان** (ئەردە.): دەسکەوان، دەسکاوونک.

**دەساودەس**: دەستاودەست.

**دەساوور** (هەورا.): دەستەچیلە.

**دەساووردە پۆرەی** (هەورا.): دەست پێداهێنان.

**دەساوێژ** (ئەردە.): ــ بوو: واتە هەڵمەتی دامێ، بەهانە، هۆ، بۆنە. ووچان، دەستاوێژ. هۆ، بەندیواری.

**دەسایەر** (هەورا.): ئاووردوو، دەستەچیلە.

**دەسە**: دەستە. (هەورا.) دەستە، دەسک، هەنگڵ، (ئەردە.) قوڵف. دەست و پێوەند. دەستە جل و بەرگێک یا دەستە پێنووس و ئیتر. چەپکەگوڵ و گژ و گیاو ئیتر.

**دەسەبەن**: دەستەبەند. ــ ی: دەستەبەندی، ڕێک کەوتن، پێکەوە کۆبوونەوە.

**دەسەبرا** (هەورا.): دەستەبرا.

**دەسەبوخچە**: دەستەبوخچە، دەستەبوخچەڵە، بوخچەی ناوونجییە.

**دەسەپاچە**: دەستەپارچە، سەراسیمە، شێواو.

**دەسەپارچە**: دەستەپارچە: دەست لەسەر ئەژنۆیان، دەسەمزرانی.

**دەسەپارچەبوون**: شێوان، بێ سەر و بەربوون.

**دەسەجڵەو**: دەستەجڵەو، پاڵەهەنگ.

**دەسەچەقۆ**: دەسکەچەقۆ.

**دەسەچرا**: دەستەچرا.

**دەسەچینە**: دەستەچینە، قەرتاڵەیێکی چکۆڵەیە میوەی تێدەکرێ و دەسکی هەیە.

**دەسەخلافکێ**: خرخاڵی ئەمسەرەو سەری لانکێیە منداڵی ناو لانکەی خۆی پێ دەخلافێنێ. دەستبازی.

**دەسەخوشک**: دەستەخوشک.

**دەسەخووێشک**: دەستەخوشک.

**دەسەداس:** تەوەرداس، دارپاچ.

**دەسەدو:** دار، تەڵە، فاق.

**دەسەدینە** (ئەردە.): چنگ ئاوێژ، دەستەو دامان، دەست بەداوێن.

**دەسەرزانی** (ئەردە.): دەستە و ئەژنۆ.

**دەسەژەن:** لۆرەلەپ، لۆلەپ، ئەرخوت.

**دەسەسەر:** سەرگەردان، واق وورماو.

**دەسەسڕ** (هەورا.): دەسڕە، دەستەسڕ، دەستماڵ. (هەورا.) دەسماڵ. دەس ئەسڕ، دەسترە، پارچە تەنراوێکی چوارگۆشەییە بۆ دەست ئەستڕین بەکار دەبرێ.

**دەسەشکێن:** دەستەشکێن.

**دەسەشکێنە:** دەسخەڕۆ، تەفرەخواردو، لەخشتەبراو.

**دەسەقوڵف** (ئەردە.): دەستەقڵف، دەستەقفڵ.

**دەسەک** (هەورا.) ئاڵوودار، دەستەک، (ئەردە.) پەراوی، نامیلکە.

**دەسەکەشتی:** کەشتی ناوونجی نەزۆر گەورە و نەزۆر گچکە.

**دەسەکەوشە** (ئەردە.): دەستەکەوشە، کالانی خەنجەر و شیر و تیر.

**دەسەکردن** (ئەردە.): دەستەکردن، ڕێکخستن، لەسەر یەکتری دانان.

**دەسەگەنم:** قولێک گەنم.

**دەسەگوڵ** (هەورا.): دەستەگوڵ، چەپەگوڵ.

**دەسەگیرە:** دەستەگیرە، دەستگیرە، گیرە، ئەو مرازەیە مۆری لەسەر دەگیرێ و لەبنەوە هۆرەیەکی گچکەی تێدەبڕن مۆرچیان ئەوجار ناو و چتی تری لەسەر هەڵدەکەن.

**دەسەلات:** دەستەلات، توانایی و دەستڕۆیین.

**دەسەلاتدار:** دەستەلاتدار.

**دەسەڵقوت** (هەورا.): لۆرەلەپ، لۆلەپی مەشکە.

**دەسەملان:** دەستەملان.

**دەسەمۆ:** دەستەمۆ.

**دەسەناو:** دەستەوناو، مەیدانە ئەسپێک.

**دەسەنە** (ئەردە.): بەخشش، خەلات، بدە.

**دەسەنەدار** (ئەردە.): خاوەندی پیاوەتی و بەخشش بێ.

**دەسەنقەس:** رەسی، دانستە.

**دەسەوار** (ئەردە.): دەستەوارە، ئەوەندە نانەیە کە بە دەست هەڵبگیرێ. (ئەردە.) ـــ: دەستەوارە.

**دەسەواکردن** (ئەردە.): پەلەکردن.

**دەسەوام** (ئەردە.): دەستقەرز.

**دەسەوانە** (هەورا.): دەستەوانە و کیسەییێکە مردووی پێ دەشۆن. دەستەوانە. دەستبەند، کەلەپچە.

**دەسەوناوانی** (هەورا.): دەسکی هاوونگێ.

**دەسەوەرە** (ئەردە.): دەستبەرە.

**دەسەودەس** (ئەردە.): دەستاودەس.

**دەسەوسار:** دەستەوسار.

**دەسەوسان:** دەستەوروستان.

**دەسەوسانی:** دەستەوروستانی.

**دەسەویەخە** (ئەردە.): دەستە و ئێخە، ئاوریشی یەکتری بوون یا لێک نزیک بوونەوە.

**دەسەهاڕ** (ئەردە.): دەسکی دەستاڕ.

**دەسەیاڵ** (ئەردە.): دەست بەیاڵی وولاخی بەرزە دا هێنان.

**دەسەیاو** (ئەردە.): توانایی.

**دەسبلاد** (ئەردە.): دەست بلاو. هەرزە و پووچ.

**دەسبار:** یارمەتی یەکتری دان لەکاتی بارکردن و خستنیدا، دەستبار.

**دەسباز:** گەمەو گاڵتە بەدەست لەیەکتر دان. *

**دەس باندەس:** دەست لەژووررووی دەستەوە.

**دەسباندەس نیان:** دەست لەسەر دەست دانان، دامان، بێچارەیی.

**دەسبەجێ** (ئەردە.): دەست بەجێ.

**دەسبەدەس** (ئەردە.): دەست بەدەست، بەنەغدی دەستاودەست.

**دەس بەدەسدان:** چەپڵەلێدان.

**دەس بەرە** (ڕۆژ.): ئەو کەسەیە لەژێر چاودێری دا بێ.

**دەس بەزاخابردن:** تەفرەدان.

**دەس بەستە:** دەست بەستراو، کار لەدەست نەهاتوو، دەستو پێ سپی. *

**دەس بەستنەتەختە:** دەست بەستن، لەکار و سوود دوور خستنەوە.

**دەس بەسینە:** کەمەر بەستە، گوێدێر.

**دەس بەسینەوەنان:** لە خزمەت وەستان. *

**دەس بەن** (هەورا.): بازنە، دەست بەند، دەستبێنێک.

**دەسبەند** (هەورا.): دەستەوانەی ژنانە.

**دەسبڕ:** دەستبڕ: درۆزن، ساختەچی، چاپ و چووپ باز. ـــی (ئەردە) دەستبڕی.

**دەسبڕین** (ئەردە.): دەستبڕین، قۆڵشکاندن، فێڵ لێ کردن.

**دەسبژێر:** دەستبژێر.

**دەسبۆ** (هەورا.): شەمامە.

**دەس بۆبردن:** دەست درێژکردن.

**دەس بێنک:** دەستبەند، بازنە.

**دەسپاک:** دەستپاک. ـــی: دەستپاکی.

**دەسپەڕ:** دەستپەڕ. ـــی: دەستپەڕی.

**دەسپەرژ** (ئەردە.): ووچان، دەرەتان، پەرژ، دەسرەس.

**دەسپەرژان:** لەدەست هاتن، دەست پەرژان.

**دەس پەرژیان** (ئەردە.): دەست پەرژان.

**دەس پەڕی:** ئاو هێنانەوە بەدەست، جڵق.

**دەسپەیداکردن:** دەستڕۆیین.

**دەسپرووانن:** دەست بەسەردەستدا هێنان.

**دەسپروانن:** دەست پرواندن.

**دەسپیانان:** دەست کوشین، شێلان، دەست لێدان.

**دەسپیانیان:** دەست کوشین، شێلان، دەست لێدان.

**دەس پیاهاووردن:** دەست پێداهێنان، دەست پێداماڵین.

**دەسپێچ** (ئەردە.): دەسرازە، پەڕۆیەکیشە نانکەر لەکاتی نان پێوەدانیدا لە دەستی دەئاڵێنن.

**دەسپێچ:** دەسرازە.

**دەسپێچەن:** خوری کە تەشی ڕێس لە جمگەی دەهاڵێنێ. *

**دەسپێچەنە:** دەسپێچک.

**دەسپێچک:** دەسپێچ، ئەندازەیێکیشە لە خوری شێکراوەوە لە دەستی دەئاڵێنن بۆ ڕستن.

**دەس پێشکەر:** دەست پێشخەر. ـــ ی: دەست پێشخەری.

**دەس پێکردن:** دەست پێشخستن، دەست پێکردن، ناوی خودا لێهێنان.

**دەس پێوەژەنن:** دەست پێداهێنان.

**دەس پێوەنان:** دەس پێوەنیان، دەرکردن، پاڵ پێوەنان.

**دەس پێوەنیان:** دەس پێوەنان، دەرکردن، پاڵ پێوەنان.

**دەس پیس:** دز، دەست پیس. ـــ ی: دزی، دزێنی، دەست پیسی.

**دەست:** لەسەری پەنجەوە تا سەرشان ـــ ی پێدەڵێن، باڵ، چەچە، (ئەردە.) چەپۆڵە، دەس، (هەورا.، بابا.) قوول. ـــ ئاویژتن: (باک.) دەست ئاڤێتن، هێرش بردن، گرتن. ـــ بەزاخاکردن: لەخشتەبردن. ـــ بەسەردا چوون: دەست بەسەردا ڕۆیشتن، دەستەلات، پەلی بەنی ئادەمی و هەموو گیاندارێک لەشانیەوە تا پەنجەکانیەتی. ـــ بەسەردا ڕۆیشتن. ـــ بەسەرداکێشان: پارازتن، داگیروزەووت کردن. دەست پێداماڵین. ـــ پێدا هێنان: داماڵین بەدەستی. ـــ تێخستن: دەست پێداکردن. ـــ داهێنان: دانەواندن، سەرشۆڕکردن. (زاخ.) تەشت، ئامان. ـــ ژێ بوون (باک.): دەست لێ بەردان، لێک جوویێ بوونەوە. ـــ ژێ کن بوون: بێ توانا بوون. ـــ کرن (باک.): دەستیاری، هاوکاری. ـــ ژی کشاندن: دەست لێ کێشانەوە. ـــ لەبنابڕین. جە ـــ بەرشیەی (هەورا.): لەدەست دەرچوون. ـــ لە ژێر سەرمان: پاپا و ناچاربوون. ـــ لێ بەردان: دەست ژێ بەردان، وازلێهێنان. ـــ لێدان: پەلاندن، هلمسین. ـــ لێ شوشتن: ناهومێد و بێ هیوابوون. دەستم بەدامێنت: دەستم بەداوێنت، ئامان، (هەو.) هیزە، لە ڕێی خودای، لە منت کەوێ. دەستێ خووە ڤەمالشتن (باک.): دەست دانەکار. دەستێ خووە ژێ شوشتن: ناهومێدبوون. دەستێک جل و بەرگ: دەستەجل و بەرگێک. دەستێ هەڤگرتن (باک.): یارمەتی یەکتری دان. بە ـــ : بەدەستەلات، بەدەستودوو. بە ـــ مووەدان: دانە دەست. بەر ـــ کرن: ئامادەکردن. بەدەستوودوو. بێ ـــ : هەژار، نەبوو، دەستکورت، پشتی دەستی خۆگەزتن: پەشیمان بوونەوە. خۆبە ـــ مووەدان: خۆدانەدەست. دانە ـــ : بەدەستەوەدان. لە ـــ خستن: لەدەست چوواندن، لە ـــ دان: دۆڕاندن، گومکردن. لە ـــ هاتن: پێکران، پەرژان. لە ـــ داهێنان. لە ـــ دەرچوون: لەدەست دان، دۆڕاندن، زیانکردن، هەل لە کیسی خۆدان. لە ـــ دەرهینان. لە ـــ ودووکەوتن: بێ هێزبوون، هەژاری. لە ـــ هاتن.

**دەستاڕ:** لەدەستهاڕەوە هاتووە، دەسار، دەسهاڕ، دەستەهاڕە، هاڕەتەپ، گێرۆزە، هێردی. لنگە ـــ : (ڕۆژ.) تادەستاڕ، تاکەدەستاڕ. دوو بەردی پانی خڕی دەسکدارە دانەوێڵەی پێ دەهاڕن.

**دەستاڕانێ** (هەو.): گەمەیێکی منداڵانەیە.

**دەستاڕەوان:** دەستاڕهێڕ، (باک.) دەستاڕڤان. ـــ ی: پیشەی دەخڵ و چتی تر لەدەستاڕکردن.

**دەستاڕڤان** (باک.): دەستاڕەوان.

**دەستاڕهێڕ:** دەستاڕەوان.

**دەستاژۆ:** دەستەمۆ، کەوێ، دەساژۆ. سست. ـــ یی: دەستەمۆیی، کەوێتی. سستی.

**دەستاڤ:** سەراو، پێشاو، ئاودەست. ـــ ا بچووک. ـــ ا مەزن. ـــ شوشتن.

**دەستاڤێتن هەڤ** (باک.): کێشە و شەڕکردن پێکەوە، پێکهەڵپڕژان، بەرەنگاری یەکتری بوون.

**دەستان:** داستان.

**دەستاڤێن** (باک.): دەستاوێژتن، گرتن، پەلاماربردن.

**دەستاو:** دەساو، دەستیاو، چێشت یا نانی دەستی کەسێکی. ـــ ی ... خۆشە. ـــ ی ... ناخۆشە. بەئاوێکیش دەڵێن پڕ بە باوەشێکی بێ. پەڵوولەیێکی شلە لە ئارد و ئاو دروستدەکرێ بۆ کارو بەرخی ساوا. ئاوێکە هەویری پێ شێلرابێ، یا ئاو و دۆیە کە بدرێ بە ئاژاڵ. ئەنجام. (ڕۆژ.) مەشق. ـــ برد: دەست و برد.

**دەستاودان:** بەدەستی تەڕ، تەڕکردنی هەویر بۆ ئەوەی باش شل بکرێتەوە و بەدەستیشەوە نەنووسێ، دانی دەستاو بەکار و بەرخ.

**دەستاودەست:** چتێکە دەستاودەست بدرێ. دەست بەجێ، دەم و دەست. ـــ ی: دەست بەدەستی.

**دەستاوون:** دەسکاوونک.

**دەستاوونگ:** دەسکاوونک.

**دەستاوێز:** جێگەدەست لەچت بۆ دەست پێگرتنی.

**دەستاوێژ:** دەستاوێز، بەردئاوێژ، دەست و پەل فڕێدانی ئەسپە لە کاتی غاردانیدا، ئەسپەکە ـــ ی جووانە لەکاتی غاردانیدا، ماوەی هاویژتنی بەردێک بەدەست وەکوو دەڵێن لێرەوە تا قوتابخانە دەستاوێژێکە. دەستهاوێژ، سفن، هۆ، ئیوەر، پەلاماربەر، هێرش بەر. ـــ ی: پەلاماردان، هێرش بردن.

**دەستاویژتن:** گرتن، هێرش بردن، دەستهاویژتن، دەست ئاڤێتن.

**دەستە:** دەسک، چەپکەگوڵ، گوورزە. ناورنجی، نیوونجی، دەستەک، چتێکە نە زۆر گەورە و نە زۆر گچکەبێ. گەل، کۆمەڵە، جوون، زەهفان، کەرت، تیپ، بەرە، (هەورا.) تۆف. ـــ پیاوێک: کۆمەڵە پیاوێک یا گیاندارێک، هوولە. هاواڵ، برادەر، هاوشان، هاوڕێ، بەڵان لە کاتێکا، کە بەپێشەوەی ناوانەوە بنووسێ: دەستەبرا، دەستەخوشک، داروودەستە. مرازێکە لەکەرەستەی خەڕەکێ دایە. بەستە. ـــ یەک قاقەز، بەستەیەک قاقەز. دەسکی شیر و خەنجەر و ئیتر. دەستگرە، دەزگرە، دەسگرە. شیشەی ئاسنی تەوون کوتانییە، کەلکێت، (هەورا.) کەرکێت، بۆتەونییە. تاخم، دەرزەن، چین، ١٢ دانە. ڕەختە. (هەورا.) بەست، خڕ، کەند. ـــ یەک جل و بەرگ، قەدێک جل. ـــ : جەستە، هەر وەکوو: کەس بە ـــ ی من نەبیت: کەس بە جەستەی من نەبێت واتا کەس وەکوو منی بەسەر نەیەت. ـــ کردن: دەسەکردن: ڕێک خستن. دارو ـــ .

**دەستەبەدەستە:** چین بەچین.

**دەستەبەر** (هەو.): یاریکار، یارمەتیدەر، وەخۆگر، وەخۆگرتوو، بەڵێنی دەر.

**دەستەبەرە:** چتێکە لەتەختە دروستدەکرێ بە چووار دەستەکی چتی پێ دەگوویزنەوە، دەستەبەر، (کۆ.) قورکێشێکە بە دووکەسان هەڵدەگیرێت و چووار دەسکی هەیە. ـــ یی: یاریکاری، یارمەتی دان، وەخۆگرتن، دەمان، دامان.

**دەستەبەرد:** کۆپەل، هێرک، خرکە، پەل. ـــ ی: بوونی یەکێک بە دەستەبەری چتێک یا کەسێک. لەدەست چوواندن، خرکە، خرک، پەل.

**دەستەبەند:** (باک.) بەلت، چینی بەند. ـــ ی: (باک.) بەلتک.

**دەستەبرا:** هاواڵ، برادەر، چەند کەسێکی، کە برادەرایەتیان خۆشبی. ـــ یەتی: هاوالأیەتی، برادەرایەتی.

**دەستەبوخچە:** دەسەبوخچە.

**دەستەپاچە:** دەستەپارچە. ـــ یی: دەستەپارچەیی.

**دەستەپارچە:** دەست بەستراو، دەستەپاچە، پەرێشان، گیرۆدە، بێ دەستەلات، چەنگەپارچە، دەستەشکاو، مەردومی دەستەوستان، (کە.، هەورا.) بەیدەست. ـــ بوون: دەست بەستران، پەرێشان بوون. ـــ کردن: دەست بەستن، پەرێشان کردن. ـــ یی: چەنگەپارچەیی، دەست بەستران، پەرێشان بوون.

**دەستەجەڕ** (باک.): گۆزە، جەڕڕە.

**دەستەجل:** دەستێک جل و بەرگ.

دەستەجڵەو

**دەستەجڵەو:** دەستەڕەشمە، دەسکەجڵەو، هەوسار، لڤان، قایشێکە لە لغاو هەڵدەکێشرێ، دەسەجڵەو، شیپەلەغاو، دەسکی جلەو و هەوسار و لغاو و نیترە، کە بە دەستی دەگیرێت.

**دەستەچرا:** چرای دەستی، قوتیلەیەکە بۆ ناو گەورە لە تەویلە و کۆزان بەکاردێنرێ.

**دەستەچن:** جوورە ترێیەکە هەر وە مایە مێوی دەچێ بەلأن شیرین ترە و بۆ مێلاق باشە و دەنکی هەیە. میوەی باش بەتایبەتی لە دار کردنەوە.

**دەستەچیلە:** بن ئاگر، (خۆ.) چاوئاگر، (زەن.) چاوڕەشکەنە، (هەورا.) دەساورر، (کۆ.، باد.، هەو.) بەرچاوکە، (ڕەوا.) دەستەچیلە، دەستە چیلکەیەکی ووشکی باریک، کە ئاگری پێ بکرێتەوە، (کۆ.) قولەچیلکەیەکە ئاوری پێ دەگوویزنەوە لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر.

**دەستەچیلکە:** دەستەچیلە.

**دەستە خورت:** لۆلەپی مەشکەی.

**دەستەخورد:** لۆرەلەپ.

**دەستەخوشک:** هاواڵ (بۆ کچان)، چەند کچێکن، کە ئاشنای یەکتری بن و یەکتریشیان خۆش بووێ.

**دەستەخوشکایەتی:** هاوالأیەتی (بۆ کچان).

**دەستەدار:** داردەست. داری نێوونجی.

**دەستەدەستە:** چین چینە.

**دەستەدز:** دەستەک دز.

**دەستەدم** (ڕۆژ.): دەستەندووی کەرەستەی جووتی.

**دەستەدوو** (موک.): (پیر.) پاشبارە، دەستەندوو، (ڕۆژ.) دەستەدم، (هەورا.، کورد.) دەستەکەوشە، دارێکە دەکوترێ بەسەر هەوجاڕدا ودەستی پێ دەگیرێ لەکاتی جووتکردنێدا.

**دەستەر:** شەقڵ.

**دەستەرە:** دەستەر، شەقڵی خەرمانان.

**دەستەڕەشمە:** دەستەجڵە.

**دەستەریڤانە:** دیارێکە بە دەستی خۆت بیبەی بۆ کەسێک، دیاری.

**دەستەژنۆ:** دەستە و ئەژنۆ، دەستەپارچە، پەک کەوتوو.

**دەستەژمێر:** دەست بژێر.

**دەستەستر:** دەستەسڕ، دەسرە.

**دەستەسڕ:** دەست ئەسترِ، دەسرە، دەسرۆک، کەمک، دەسماڵۆک.

**دەستەسووار:** سەلەف، (باک.) سەلپەک.

**دەستەشکاو:** دەستەپارچە. ـــ ی: دەستەپارچەیی.

**دەستەشکێن:** دەستخەڕۆ، تەفرەدراو.

**دەستەک** (ڕەوا.): دەزگرە، (دزە.) داری دارەڕای سەرکاریتەو سەربانانە. (سوور.) دەست، (دەر.) کەرکێت، (بۆل.) هەپۆ، شیشەی ئاسن یا دارێکی پەنجەدارە تەونی پێ دەکوترێ. ئاسنێکە کەلأشی پێدەکوترێ. (موک.) مشتە. (باک.) پایە، دەستگا. داری دارەڕایە لەدارە بەڕوو.

**دەستە کەوشە** (هەورا.): دەستەندوو، دەستەدوو، دەسەدوو.

**دەستە کچ:** کچێکە، کەتەمەنی هەشت نۆساڵێک بێ یانی نە زۆر منداڵ ونە زۆر پێگەیشتبێ.

**دەستەکدز:** یەکێکە ماڵ بنێتەوە بۆ دزینی.

**دەستەکردن:** کردنی چت بەدەستە.

**دەستەکوڕ:** کوڕێکە لەتەمەنی ٨ ، ٩ ساڵیدا بێ یانی نە زۆر منداڵ و نە تەواو پێگەیشتبێ.

**دەستەگۆزەڵە:** دەستگۆزک.

**دەستەگۆشە:** دەستەکەوشە.

**دەستەگوڵ:** دەسکەگوڵ، چەپکەگوڵ.

**دەستەگیرە:** گیرەی مۆرهەلکەنانە، کە مۆری لەناو قایم دەکەن ئەوسا هەڵی دەکەنن.

**دەستەلات:** هێز، توانایی، دەسەلات، ڕاسەر، (باک.) کەلیژ. بە ـــ : دەستەلاتدار، ژێهاتی، زۆردار. ـــ بەسەردا پەیداکردن: پشت شکاندن، بەسەردا زاڵ بوون، پشت شکێناندن. ـــ بەسەرداشکان: ژێهاتن، دەرەقەت هاتن. بێ ـــ : گەلۆر، گێل، حۆل.

**دەستەلاتدار:** بە دەستەلات، دەست درێژ، بەدەست، ژێهاتی. ـــ بوون: ژێهاتن. ـــ ی: دەستدرێژی.

**دەستەڵە:** گۆزەی گچکەی بێ لوولە.

**دەستەلێژە** (شار.): مرازێکە لەکەرەستەی خەرەکێدا.

**دەستەمستە:** (هەورا.) دەستەمستەی کەرەستەی جووتی، (هەورا.) مشتە، دەستە مشتە، ئەو جێگا دەستەیە،کە بەپاشبارەوەیە.

**دەستەمشتە:** دەستەمستە.

**دەستەملان:** دەست لەملی یەکتری کردن، چەچەملان (زاراوەی منداڵان). ـــ بوون. ـــ کردن: دەست لەملی یەکتری کردن.

**دەستەمۆ:** دەستاژۆ، خەڕۆ، دەستخەڕۆ، کەوی، کەیی، (کە.) دەسەمۆ، ڕام، گیاندارێکە لە ماڵێ دا ڕام و کەوی بووبێ و هەرکاتێکی دەستی بۆ ببەی بگیرێ. ـــ بوون. ـــ کردن.

**دەسەندوو:** دەستەوجاڕ، دەستەدم، دەستەکەوشە، دارەقیتەی ناو کەرەستەی جووتییە.

**دەستەنک:** دەست تەنک. ـ ی: دەست تەنکی.

**دەستەنگ:** هەژار، دەستکورت، دەست تەنک، دەست بەتاڵ. ـ ی: دەست کورتی، هەژاری، دەست تەنکی.

**دەستەوا:** نۆبە بەنۆرە گۆڕینەوە، (بابا.) دەستیاو، هەرەوەز، (بابا.، جا.) ترومپا، شین و شایی.

**دەستەوار:** ئەوەندە نانەی ،کە لەسەر یەکتری دانرێ، کە بە دەستێکی هەڵگیرێ ـ ی پێدەڵێن.

**دەستەوارە:** چەندنان یا چەند کولێرەیەکە، کە لەسەر یەکتری دانرابن و بەدەست هەڵبگیردرێت.

**دەستەوانە:** دەستێنە، دەستە، لەپک، (هەورا.) دەستکێش، (دەر.) پەنجەوانە، (فە.) دەسوانە، چەند مووروویێکی هۆنراوەوەیە کە ئافرەتان لە دەستیانی دەکەن. ـ ی ژنان: دەزبەند، دەسبەند، دەستبەند. (دەر.) دەربازن. دەستوێنکی، دەسوێنک.

**دەستەژنۆ:** دەستەوئەژنۆ.

**دەستەوئەژنۆ:** دەستەژنۆ، دەستەپاچە، دەستەپارچە، دەستەشکاو.

**دەستەودامان بوون:** داوێن گرتن، پاپابوون.

**دەستەوەدان:** خۆ بە ـ : خۆدانەدەست.

**دەستەوەرە:** منداڵی بەکار و گوێدێر و کارگوزار جا هی خۆتبێ یا هی لاوە.

**دەستەوەکەر:** دەستکەرەوە. ـ ی: دەستکردنەوە.

**دەستەوجاڕ** (هەو.): دەستەهوجاڕ، (گەر.) دەستەندور.

**دەستەودەست:** دەستاردەست.

**دەستەودۆ** (موک.): دەستندووی جووتی.

**دەستەوسار:** دەسکەوسار، هەوسار، دەسەوسار، ڕەشوڕەشمە.

**دەستەووسان:** دەستەووستان.

**دەستەووستان:** خاو و سست و بێکارە، (ڕۆژ.) تەپڵەتڕ، بێ دەستەڵات، دەستو پێ سپی، دەستەپارچە.

**دەستەوکێرد:** مرۆڤێکە یا گیاندارێکە، کە کەوتبێ و چرچی لاقی لێ ڕاکێشابێ.

**دەستەوناو** (کە.): سەرەوژێر، جێگای سەرەولێژ.

**دەستەویەخە:** دەستدانە ئێخەی یەکتری لەکاتی جەنگیدا، بە جێگا و شوێنی نزیکیش دەڵێن.

**دەستەهاڕە** (جا.): دەستاڕ.

**دەستەی فەقێ یان:** کومەڵەیەک لەفەقێ یان، سفرەی فەقێ یان.

**دەستبار:** دەزبار، دەسبار، دووکەس دەست پێک بگرن و باری باوێنە سەر دەستیان بۆ بارکردن.

**دەستباز:** کەسێکە زۆر حەز لە گەپ و گاڵتەیێک بکات، کە بە دەست ئەنجام بدرێ، دەستواز. ـ ی: گەپ و گاڵتەکردن بەدەست، دەستوازی.

**دەست باگردان:** دەسباگردان، دەسکەباگردان.

**دەست بەئاوگەیاندن:** مەبەس لەچوونە سەرپێشاوە.

**دەست بەتاڵ:** بێکار، بێ ئیش، سەرسووک. کەسێکە بەدەستی بەتاڵ وەدووی چتێکی کەوتبێ. میوانێکە بەبێ دیاری ڕوو لە ماڵی خانە خوێی بکات. ـ ی: بێکاری، سەرسووکی، بێ ئیشی.

**دەست بەجێ:** ڕاستەوخۆ، کورج، دەم و دەس، دەم و دەست، خرپ، تاڤل، (باک.) جهدە، گەرماوگەرم، دەردەم، هەرئەو دەمە. ـ یی: کوتوپڕی.

**دەست بەدەست:** دەستاودەست، کوتوپڕ.

**دەست بەدەستدادان:** مەبەس لەپەشیمانییە، دەرچوونی هەلێک لە دەست.

**دەست بەربوون:** تەواوبوون لەکار، جووێ بوونەوە، تەرکی بەندیواری.

**دەست بەردار:** مەبەس لە کەسێکییە، کەدەستی لەکارێک هەڵگرتبێ. ـ بوون: برێتییە لە دەستهەڵگرتن لەکارێکی. ـ ی: دەست هەڵگرتن.

**دەس بەردەس** (بابا.): دەستبڵاو.

**دەست بەردان:** مانگرتن، دەست لەکار هەڵگرتن، مەبەس لە جووێ بوونەوەی دووکەسانە لە یەکتری: لەیەک جووێ بوونەوە.

**دەست بەردایی** (باک.): دەستبڵاو، ئەبلەخەرجی.

**دەست بەرنەدان:** پارێزگاری.

**دەست بەڕووەوەنان:** مەبەس لە وەلآمدان و ناهومێد کردنی یەکێکی، کە داوای چتێکت لێ بکات.

**دەست بەزاخاکردن:** تەفرەدان، دەستبڕین، هەڵخەڵەتاندن.

**دەست بەسەر:** دەسبەسەر، ئەوکەسەیە لەژێر چاوەدێری دابێ و بە فەرمانی میری لە شارێکی یا لە شوێنێکی نەچێتەدەرەوە.

**دەست بەسەر دابڕین:** زەوتکردن.

**دەست بەسەرداگر:** زەوتکار.

**دەست بەسەرداگرتن:** زەوتکردن، داگیرکردنی چتێک.

**دەست بەستە:** مەبەس لەمرۆی دەستخەڕۆیە.

**دەست بەستراو:** کەسێکە دەستی گرێ درابێ، دەستەپارچە.

**دەست بەستن:** دەستخەڕۆکردن، لەخشتەبردن: دارا باش دەستی بەستم، دەست بڵاو.

**دەست بەقرپ:** کەسێکە هەرچتێکی بێتە دەست زوو لەناوی ببات.

**دەست بەقلپ:** کەسێکە هەرچتێکی بێتە دەست زوو لەناوی ببات.

**دەست بەلاڤ** (باک.): دەست بڵاو، دەست بەردەس، تەبلەخەرج. ـ ی (باک.): دەست بڵاوی .

**دەست بەند:** دەسبەند، دەستەوانەی ئافرەتان، چتێکە وەکوو دەستەوانە وایە و لە گەوهەربەند و ئیتر لەباسک دەکرێ. پەت یا زنجیرێکە پەلی وولآخانی پێ دەبەسترێتەوە.

**دەستبڕ:** دەسبڕ، قۆلبڕ، ساختەچی، هەڵخەڵەتێن.

**دەستبرا** (باک.): دەستەبرا. ـ تی (باک.): دەستەبرایەتی.

**دەستبڕان:** لەکار و فەرمان بوونەوە. بێ بەهرەبوون، ناهومێدبوون، دوور کەوتنەوە. تەفرەدران، فریوخواردن، خچان، خەڵەتان.

**دەستبڕاو:** دەسبڕاو، قۆلشکاو، تەفرەدراو.

**دەستبڕی:** دەستبڕین.

**دەستبڕین:** دەست بەتیغ بڕین. دادۆشین، لەخشتەبردن، تەفرەدان، قۆڵشکاندن، تاودان، خچاندن.

**دەستبزێو:** بزۆز. سەربزێو، سەرکێش. ـــ ی: بزۆزی. سەربزێوی، سەرکێشی.

**دەستبژێر:** بژاردە، بەبژاردە، دەست ئەژمێر، دەسبژێر، تایبەتی. ـــ ی: دەستەژمێرکردن.

**دەسبقلپ:** دەست بەقرپ.

**دەست بڵاو:** دەست بەلاف، دەست بەردەس، پێ پانەر، لەبەرددەر، مەبەس لە کەسێکە ماڵی خۆی بەفیڕۆ بدات. ـــ ی: ماڵی خۆ بەخۆڕایی بەخەڵک دان.

**دەستبووری:** کەسێکە، کە هەرقسەی هەبێ و کردەوەی نەبێ.

**دەستبوون:** مەبەس لە دەستڕۆیشتن و دەستەڵاتە وەکوو دەڵێن: یا خوا هەرگیز زۆردار دەستی نەبێ. بەشدار بوون: هەرامە دەستی هەیە لەم کارەدا یا دەستی کەرێتی هەیە.

**دەستبێن** (مەک.): گوریس یا پەت یا شریتێکە بەشەو شوان لە شوێنیدا سەرێکی لەباسکی خۆی و سەرەکەی تری لە ئاژاڵیکی قەڵەو دەخات و دەنووێ بۆ ئەوەی، کە گورگ بۆیان بێت ئاژاڵەکان دەرەونەوە و شوانەکە وەئاگادێت.

**دەستبێنک** (سور.): دەست پێچەک، دەسترازەی لانکێیە.

**دەست پاک:** سەرڕاست. ـــ ی: سەرڕاستی.

**دەست پانکردنەوە:** بریتییە لە پاڕانەوە و سواڵکردن.

**دەستپەر:** دەسپەر، کەسێکە بەدەستی خۆی ئاسوودەکات.

**دەست پەرژان:** دەست نەگیران و فریاکەوتن بۆ کارێک.

**دەست پێچ:** دەس پێچ، پەڕۆیەکە نانکەر لە دەستی دەئاڵێنی تا لە کاتێکیدا، کە نانی بەتەندوورەوە دەدات دەستی نەسووتێ.

**دەست پێچەک:** دەسرازە، دەسترازە، دەست بێنەک، دەستپێچک.

**دەست پێچەنە:** دەست پێچک.

**دەست پێچک** (باک.): پاکەت، بەستە، (سۆ.) ئەندازەیێکە لە خوری شێکراوەوە، کە لە مەچەک دەئاڵێنرێ بۆ ڕستن، دەست پێچەنە.

**دەست پیس:** دز، ناپاک. ـــ ی: دزی، ناپاکی.

**دەست پێشخەر:** بڕوانە: دەست پێشکەر. ـــ ی: بڕوانە: دەست پێشکەری.

**دەست پێشکەر:** کەسێکە، کە بەر لە کەسانیتر دەست بەکارێک بکات. ـــ ی: دەس پێشکەری، دەست پێشخستن لەیەکێک لە کردار یا گوفتارێکیدا، دەستپێش خستن.

**دەست پێشین** (باک.): پێشەکی، پارەی پێشەکی.

**دەست پێک** (باک.): بەرایی، هەوەڵ.

**دەس تەریقانە** (ئەردە.): دیاری، سەوقات.

**دەست پێکردن:** دەست پێکرن، دانەبەر، هەرێ کردن، تێپەڕبوون، تێوەچوون، پێداکێشان، خۆلەبەرنان، پێدادان، تێوەچوون، داگرتن، مل لەبەر نان، مل لێ نان، دەستدانە گوفتار یا کردار یا گوفتارێک لە پێش ڕۆیشتنی.

**دەست پێکی** (باک.): بەربێژی.

**دەست پێوەگر:** ئابڕۆرهاڵ.

**دەست پێوەگرتن:** ئابڕۆری.

**دەست پێوەنان:** پاڵپێوەنان، دەربازکردنی یەکێک لە کارەساتێک.

**دەست پیس:** مرۆڤی گەند، دزی ناوماڵ یا دوکان و ئیتر. ـــ ی: مەبەس لە دزینی ناو ماڵ و دوکان و ئیترە.

**دەست تەنگ:** مەبەس لەمرۆی دەستکورتە. (باک.) دەست هشک، دەستکورت، تەنگدەس، تەنگدەست، هەژار. ـــ ی: (باک.) دەست هشکی، تەنگدەستی، دەستکورتی.

**دەست تێخستن:** دەست لەناونان.

**دەست تێدان:** کارتێداکردن. هەڵوەشاندن.

**دەست تێکەڵ کردن:** دەست لەگەڵ یەکتری تێکەڵکردن، مەبەس لە پێکەوە نوستنی پیاو و ئافرەتێکییە.

**دەست تێوەدان:** (باک.) پاشەرۆک، خۆتێکەڵ بەکاری ئەم و ئەو کردن.

**دەستچەپەڵ:** دەسچەپەڵ.

**دەستچن:** چنینی دەست، بەدەست چنین. بژاردە، هەڵبژێرراو. بەدەست گوڵچنینەوە.

**دەست چێکری** (باک.): دەسکر، دەستکر، چتێکە بەدەست دروستکرابێ.

**دەست چێن:** دەست نێژ، چتێکە بەدەست چێنرابێ لە زەویدا.

**دەستخان** (باک.): لاسایی.

**دەستخەت:** دەستنووس، (باک.) کار، کردەوە.

**دەستخەتکری** (باک.): کارخانە.

**دەستخەڕۆ:** ڕام، کەوی، دەستەمۆ، فریودراو، تەفرەدراو، دەستەشکێن کراو. ـــ کردن: تەفرەدان، دەست بڕین، لەخشتە بردن. ـــ یی: ڕامی، کەوێتی، دەستەمۆیی، فریودان.

**دەستخۆر:** پلاو و هەموو جوورە چێشتێکە، کە نە زۆر توند و نە زۆر شل بێ.

**دەستخۆش:** دەستخۆش، ئافەرین، خۆشبێ. قوربان، کاوگەردوون.

**دەستخۆشانە:** بەخشش، خەلات، کەبدرێ بە کەسێکی لەبەرانبەر کارێکیدا.

**دەستخۆشی:** ئافەرین کردن لە ئەنجامدانی کارێک.

**دەستخورێنە:** گمز گمزۆک، گمزگمزک.

**دەستدار:** توانا، بەدەستەڵات. ـــ ی: تووانایی، دەستەڵاتداری.

**دەستدان:** لەوان، گونجان، بوونی، بەکارهاتنی چتێک بۆ چتێک؛ ئەم پەرتووکە بۆ ئەو قوتابیە دەست دەدا.

**دەستدروو:** چتێکە بە دەست دروابێ.

**دەستدرێژ:** زۆردار، دەستەڵاتدار، بالادەست، گوندار، بەقوون و حوونەر، دەستدار. دەوڵەمەند، ساماندار.

**دەستدرێژک** (باک.): ماشە.

**دەستدرێژی:** زۆرداری، دەوڵەمەندی، دەستداری، زۆر، چەور.

**دەستدۆز** (ڕەوا.): دەستکیس. ـــ ی: دەستکیسی.

**دەسترازە:** پێچەنە، دەست پێچەک، دەسبێنک، دەست پێچک، بەن یا پەت یا کەژوو و پەڕۆ و پالاتی منداڵ بەستنییە لە لانکێدا.

**دەستڕاست:** دەسڕاست، کەسێکە نیشانە باش بنگێوێ، نیشانە ئەنگێو.
ـــ ی: دەسڕاستی. نیشانە ئەنگاوتن.

**دەستڕاگرتن:** ڕاوەستان.

**دەسترە:** دەسرە.

**دەستڕەس:** گەیشتنەدەست، وەدەست کەوتن، چتێکە دەستکەوتنی ئاسان بێ.

**دەستڕەش:** دز، ناپاک، کەسێکە هەر چتێکی لێوە ببینرێ یادەستکەوێ بێ فەڕ و شووم بێ، دەست ناپیرۆز. ـــ ی: دزی، ناپاکی. دەست ناپیرۆزی.

**دەستڕەنگین:** کەسێکە بەدەستی خۆی پیشە و کرداری جوان بزانێ.

**دەستڕۆیشتن:** دەستڕۆیین، چەقاندن.

**دەستڕۆیشتوو:** بالادەست، زاڵ، چیرە، دەستدرێژ، بەدەستەلات. دەوڵەمەند، تێر. ـــ یی: دەستدرێژی، دەستەلاتداری.

**دەستڕۆیین:** دەستڕۆیشتن، دەستەلات، ڕاکرن و ڕانین، دەوڵەمەندی.

**دەستڕۆییو:** دەستڕۆیشتوو، دەوڵەمەند.

**دەستڕێژ:** ڕێژنە، ڕێژەو، شێلنگ، تاق و تۆقی چەکان بەدەستە و بەبێ وڕچان. شێلنگی بەردان یا چەکان، تەقاندنی چەند گوللەیێکی بە جارێکی لەلایەن چەند کەسێکەوە بەرەو ئامانجێک. ـــ ی: شێلنگ کردن.

**دەست سپی:** بڕێتییە لە کەسێک، کە کار و پیشە یا کردارێکی وا نەزانێ خۆیانی پێ بژێنی.

**دەست سڕین:** دەست ئەسترین.

**دەست سڕینەوە:** دەست ئەسترینەوە.

**دەست سفک** (باک.): دەست سووک. ـــ ی (باک.): دەست سووکی.

**دەست سووک:** دەست سفک، تەڕدەست، چابوکدەست. ـــ ی: تەڕدەستی، چابوکی، دەست سفکی.

**دەست شڕ:** دەست بڵاو، (ڕۆژ.) دەست شلپ. ـــ ی: دەست بڵاوی، (ڕۆژ.) دەست شلپی.

**دەست شکان:** شکانی دەست، تەفرەخواردن، ساختەلێکران، خچان.

**دەست شکاندن:** شکاندنی دەست. تەفرەدان، خچاندن.

**دەست شکانن:** دەست شکاندن.

**دەست شکێن:** لەخشتەبەر، ساختەچی.

**دەست شلپ** (ڕۆژ.): دەست بڵاو.

**دەست شۆ** (باک.): لەگەنی دەست شوشتنییە؛ دەستشۆر، مێزی دەست شوشتنێ، دەستشۆک.

**دەست شۆر:** شوێنێکی تایبەتییە، کە هەر دەستی لێ بشۆردرێ.

**دەست شۆرک:** دەستشۆر.

**دەست شۆرین:** مەبەس لە نائومێدبوون لە کارێک یا لە کەسێک. *

**دەست شوشتن:** دەست شۆرین.

**دەست شێل:** هەویر یا قوڕێکە بەدەست شێلرابێ.

**دەست شین:** دەست کەوە.

**دەستفرەه** (باد.): دەوڵەمەند، دەستدرێژ.

**دەستفرەیی:** دەوڵەمەندی.

**دەست فرۆش:** دەستگێڕ. ـــ ی: دەستگێڕی.

**دەستڤالا** (باک.): دەست بڵاو، ڕووت، بێ بەش. ـــ یی: دەست بەتاڵی، ڕووتی، بێ بەشی.

**دەست ڤالە** (باد.): دەست بەتاڵ.

**دەست ڤالەیی:** دەست بەتاڵی.

**دەستڤانک** (باک.): پیشەوەر، گەوهەرساز.

**دەستڤەکر، دەستڤەکەر:** دەست بڵاو.

**دەستڤەکری:** دەستڤەکەری، دەست بڵاوی.

**دەستقەرتاڵە:** (بابا.) بەرچنە.

**دەستقەرز:** قەرزێکە بۆ ماوەییێکی دیاری کراو بدرێ و وەربگیرێتەوە ودەست بەدەست بدرێ بەیەکێکی.

**دەستقووچان:** پەنجەی دەست پێکەوەنان، مەبەس لەچرووکی و ڕژدیشە.

**دەست قووچاندن:** پەنجە لێک نان ونوشتاندنەوە.

**دەستقووچاو:** مەبەس لەمرۆڤی چرووک وپیسۆکە.

**دەستک:** دەسکی گوڵ و ئیدی. (باک.) دەسکی هەرچتێکی بێ، وەکوو خەنجەر و پێمەرە و ئیتر.

**دەستکار:** دەستکوت، دەستکرد، دەسکرد، دەسکار، دەستچێکری، دەسکر، دەستکر. ـــ ی: دەسکری، دەستکری، دەستکوتی. ـــ تێداکردن.

**دەستکەلا:** دەسکەلا، کەللا، هەڵمات یا گووێزێکە هەمیشە تیری تێ بگیرێ.

**دەستکەوت:** قازانج، دەسکەوت. بەرە، سوود، کەلک، دەرامەت.

**دەستکەوتن:** وەدەستکەوتن.

**دەستکر:** دەستکرد. چتێکە بەدەست دروستکرابێ، چتی تایبەتی دروستکراو.

**دەستکراوە:** بڕێتیە لەمەردومی دڵفراوانی بەخشندە.

**دەستکرد:** دەستکار، دەسکار، دەسکوت، دەسکرد، دەست چێکری. دەسکر، دەستکوت.

**دەستکردنەوە:** دەستەوەکەری، بەرانبەری کردن، دەست وەشاندن لە شەڕا.

**دەسکوت** (باک.): کار و فەرمانێکە بە دەستکرابێ.

**دەستکوتان:** خۆ نزیک کردنەوە، بە دەست لە چتێکی گەڕان لە تاریکیدا یا کوورێک. بەدغەکی، سپڵەیی، ناپاکی.

**دەستکورت:** هەژار، بێ سامان، نەبوو، گردەنشین، بێ باڵ، بێ دەست، کەمدەست، ناتاج، بارکەوتوو، نەدار. ـــ ی: هەژاری، بێ سامانی، نەبوویی، گردەنشینی، بێ دەسی، ناتاجی، کەماسایی، ئاوسەرکەمی، نەداری، ناگوزیری، ناگزووری، کەماسی.

**دەستکوژ:** باڵندە، ئاژاڵ یا ڕەشەوولاخ و گامێش و کەڵ و چتی وایە، کە بەدەست بکوژرێتەوە، ئێمە ـــ ی فەلان و جوولەکان دەخۆین، بەڵان جوو هی مە ناخۆن.

**دەستکیس:** (هەورا.) دەسکیس، دایکەدزانە، (ڕەوا.) دەستدۆز، (باک.) دزدەستەک، ڕێ نیشاندەری دزان، دزی بەڵەد و شارەزا، کە

رابەری دزان بکات. ـــ ی: دەسکیسی، ڕێ نیشاندانی دزان، (ڕەوا.) دەستدزی، (هەورا.) دایکەدزانەیی.

**دەستکێش:** (هەورا.) دەسکێش، دەستگۆرە، دەستەوانە، پەنجەوانە، (باد.) دەست لەپ، لەدەزوو یا بەن و یا چەرم دروستەکرێ. چاوساخی کوێران.

**دەستکێشان:** ڕێ نیشاندان، ڕاکێشانی دەستی کوێران.

**دەستکێشانەوە:** واز لە نانخواردن یا کار و بارێکی تر هێنان.

**دەستکێشاندنەوە:** دەست پێ لە نانخواردن هەڵگرتن یا کار و بارێکی تر، کە پێی ئەسپێردرابێ.

**دەستکێشی:** دەستکێشان.

**دەستگا:** دەسگا، دەزگا، دەزگەە، (باک.) دەستگەه، کارگە، دەستەک.

**دەستگا گێڕ:** دەزگا گێڕ، پیشەگەر. ـــ ی: دەزگاگێڕی.

**دەستگە:** دەستگا.

**دەستگەیشتن:** دەست پەرژان.

**دەستگر:** یارمەتیدەر، یاریکار. دەزگر.

**دەستگران:** دەست قورس لە لێدانێدا یا لە کاروباردا. تەمبەڵ، خاو، سست. ـــ ی: دەست قورسی لە لێدانێدا. تەمبەڵی، خاوی، سستی.

**دەستگرە:** دەزگرە.

**دەستگرتە:** دەزگران.

**دەستگرتن:** دەسگرتن، دەزگرێیی، یا جڵەوگرتنی یەکێک، لە کارێک، کەپێی ئەسپێردرابێ. یارمەتی دان، یاریکاری کردن.

**دەستگرتنەوە:** دەستکێشانەوە و دەست پانکردنەوە. بەری دەست خوێندنەوە، مەبەس لەپاشەکەوتکردنیشە.

**دەستگرتی** (باک.): بەرچاوتەنگ، چرووک. دەزگیران، وادیارە، کە لەپێشدا ژن و مێرد بۆ مارە برینێ دەستی یەکتریان گرتووە.

**دەستگروێی:** بروانە: دەستگیرۆیی.

**دەستگۆڕ:** دەسگۆڕ، بەقەستی گۆڕاو.

**دەستگۆرە:** دەستکێش.

**دەستگۆزک:** دەسکی گۆزەڵەی، هەنگڵ.

**دەستگوێز:** دەستگۆز، بەتایبەتی گوێزران.

**دەستگێڕ:** دەزگێڕ.

**دەستگێڕانەوە:** گێڕانەوەی دەست لەکارێک و لێ پەشیمان بوونەوەی.

**دەستگیر:** پیرێکی خوا پەرستی خوێندەوارە، کە ڕێگای ڕاست بە نامۆژگاری نیشانی ئەم و ئەو بدات، یارمەتیدەر، یاریکار. (باک.) دەزگیران، دەسگیر، قازانج، دەسگر، دەستگر، ـــ بوون، ـــ کردن.

**دەستگیرانی** (باک.): دەزگیران.

**دەستگیران:** دەزگیران. خەریک بوونە بە کارێکەوە.

**دەستگیربوون:** دەستکەوتن.

**دەستگیرکردن:** بە دەستهێنان.

**دەستگیرۆیی:** یارمەتی دانی یەکێک بەدڵفراوانی.

**دەستگیری:** دەسگیری، ئەمەگداری.

**دەست لەبنابڕین:** تەفرەدان، فریودان.

**دەست لەپ** (باد.): دەستەوانە، دەستکێش.

**دەست لقۆک** (باک.): ڕەفتار.

**دەست لێدان:** دەس لێدان، هلمسین، دەستکاری کردنی چتێک.

**دەست لێ شوشتن:** ناهومێد و بێ هیوابوون.

**دەست لێک بەردان:** بریتییە لەجوێ بوونەوەی دووکەس لەیەکتری بە ئێکجاری.

**دەست لێکێشانەوە:** کێشانەوەی دەست لەچتێک.

**دەست لێنان:** دەست دانانە سەر جێگایەک لەئەندامی لەش بۆ ئەوەی بزانرێ لێ دەدا یا نا.

**دەست لێوەشاندن:** دەستکردنەوە لەیەکێک.

**دەست لێهەڵگرتن:** وازهێنان لەکارێک.

**دەستما** (باک.): ژنی حیز، جندە، سووزمانی.

**دەستماڵ:** (هەورا.) لەچەک، دەسماڵ. دەسرە، دەسترە. پێچ، مێزەر.

**دەستماڵۆک** (باک.): دەسرە، دەسترە.

**دەستمایە:** دەسمایە، دەزمایە، سەرمایە، مایە، پارەیەکە کڕین و فرۆشتنی پێ بکرێ.

**دەستمایەدار:** سەرمایەدار، دەزمایەدار، مایەدار، کەسێکە دەستمایەی بە دەستەوەبێ. ـــ ی: سەرمایەداری، دەزمایەداری، مایەداری.

**دەستمەنجەڵ:** مەنجەڵی دەستە و ناوونجی، (باک.) بەرووش، پاتیلە، زەرگ.

**دەستمز:** مافی دەست.

**دەستمێژ:** دەستنوێژ.

**دەستمیز:** بەدەست خۆ ڕەحەت کردن.

**دەستمێژ** (باک.): دەستنوێژ، سەراو، پێشاو. ـــ ابچووک: پێشاوی گچکە (میز). ـــ امەزن: پێشاوی گەورە (پیسایی). ـــ گرتن: دەستنوێژ هەڵگرتن. ـــ ڕاکرن: دستنوێژ هەڵگرتن.

**دەست نەکری** (باک.): ساخ، دەست لێ نەدراو.

**دەستندە:** تایبەتی، ئابۆری.

**دەستنڤیس** (باک.): دەستنووس، دەسنووس.

**دەستنڤیسار** (باک.): دەستنووس.

**دەستنڤیسی** (باک.): دەستنووسی.

**دەستنماز:** دەستنوێژ.

**دەستنووس:** دەستخەت، نڤیسار، دەست نڤیسار، دەست نڤیس.

**دەستنووسین:** دەست نڤیسین، خەت.

**دەستنوێژ:** دەستنوێژ، دەستمێژ، دەم و چاو و سەر و لاق شووشتنە بۆ نوێژکردن. ـــ هەڵگرتن: دەستمێژڕاکرن. ـــ شکاندن: دەستمێژ شکێناندن.

**دەستنێژ:** نوێنەر. بەدەست چەقێنراو، دەستچێن، دارێکە مرۆ بەدەستی خۆی چەقاندبێتی. دەستکار. یا مەبەس لە یەکێکە، کە دات مەزراندبێ و پێت گەیاندبێ.

**دەست نیشان:** دەس نیشان کردنی کچێک بۆ کوڕێک. ـــ کردن: دیاری کردن، نیشانەکردن، تات کرن، تەهتکرن، چتێکە لەبەر باشی و پوختی نیشانە کرابێ. نانەوەی چتێک بۆ دزینی.

**دەستوو** (بابا.): دەسکی گوڵ و ئیتر.

**دەستواز** (ڕۆژ.): دەستباز. ـــ ی (ڕۆژ.): دەستبازی.

**دەستوەشاندن:** بەدەست لێدان، بۆ لێدانی شێتان بەکاردەبرێ.

**دەستوەشێن:** ئەو کەسەیە بەدەستی لەکەسێکی تر بدات جا ـــ شێت بێ یا ژیر.

**دەست و بـرد:** تەردەستی، چالاکی، خێرایی، توانایی لەکار و بار هەڵسووڕاندنیدا.

**دەست و پا** (ڕۆژ.): دەست و پێ.

**دەست و پێ:** (ڕۆژ.) دەست و پا، دەست و پێوەند. منداڵی گچکە یا نۆکەران.

**دەست و پێ سپی:** بێکارە، خاوخلیچ، سست، تەمبەڵ.

**دەست و پێوەند:** دارودەست، دەست وپێ، بەردەست، ژێردەست، وەچ، منداڵی گچکە یا دەستەی نۆکەران.

**دەستودوو:** دەستەلات، هێز، توانایی. هەبوونی، دەوڵەمەندی. لە ـــ خستن: بێ هێز و توانا کردن، دەستکورت کردن. لە ـــ کەوتن: بێ هێز و توانا بوون، هەژار ودەستکورت بوون.

**دەستوور** (باد.): یاسا، (هەورا.) دەسوور، (باک.) ئازین، بنە، بنەگە، داڵنگ، باوی کۆمەڵایەتی. شێواز، وودم، پایەدۆستی، خولک. ڕێزمان، دەهکەر، بنگەهین، ڕێ پێشان دان. کەفاوی سابوونی و چتی دژی گرفت. ـــ کردن: سابوونا و لەناوکۆمی گرفتدارکردن.

**دەستووردان:** فەرماندان بەکارێک.

**دەستووردای** (باک.): دەستوور دراو.

**دەستوورکردن:** ڕایی کردنی گرفتی نەخۆش بەهۆی دەستوورەوە.

**دەستوورنامە:** وودمنامە. یاسانامە.

**دەستولەبانسەری:** بەختی بە بەختی تۆبێ، خووا ئەوەی بەسەر تۆی هێناوە بەسەرویشی بێنێ.

**دەستومشتاخ:** دەست و مۆچ.

**دەست و مۆچ:** ماچکردنی دەستی یەکتری لەڕووی خۆشەویستییەوە.

**دەستوێل نیان:** دەست لەسەر نێوچاوان دانان.

**دەستهاوێژ:** دەستاوێژ.

**دەست هەڵبەست:** بەدەست هەڵبەستراو، درۆیەکە بەتایبەتی ڕێکخرابێ.

**دەست هەڵگر:** دەسهەڵگر، وازهێنەر.

**دەستهەڵگرتن:** دەسهەڵگرتن، وازهێنان لەکردارێک یا گوفتارێک.

**دەستهەمان** (باک.): پارێزگار. ـــ ی (باک.): پارێزگاری.

**دەستهوجار:** دەستەوجار، دەستەندوو.

**دەستهشک** (باک.): دەست تەنگ، هەژار. ـــ ی (باک.): دەست تەنگی، هەژاری.

**دەستهلانین** (باد.): دەستکردنەوە.

**دەستی** (زا.): دەسک. چتێکە دەست بەدەست بدرێ بە یەکتری.

**دەستیارسەرکردە:** جێگری ئەفسەران.

**دەستیار:** دەستار، دەسیار، یارمەتی دەر، یاریدەر، دەسیاو، (باک.) دۆست، برادەر. ـــ ی: یارمەتی یەکتری دان، دەسیاری. (باک.) دۆستایەتی.

**دەستیاو** (جا.): یارمەتی، یاریدە، هەرەوەز، دەستەوا، زبارە، چاکەکردن بەرانبەر بە یەکێک، کە چاکەی لەگەڵ کردبێ. یاریدە دانی جووتیارە بە یەکتر لەکاتی دروێنەو یا تووتن چەقاندنێدا.

**دەستی دەستی:** ئەمرۆ و سبەی پێ کردن، فریودان، تەفرەدان، هەڵفریواندن. کەسێکە هەر ڕۆژەی لەگەڵ کەسێکی برادەر بێت.

**دەستی ڕاست:** دەستی لای ڕاستە. سەرەک وەزیر. بەخشش، خەڵات.

**دەستی شکاووم:** داخەکەم.

**دەستێنە:** دەستەوانە.

**دەستجەم** (ئەردە.): تێکرا، گشتی.

**دەسجێ** (ئەردە.): دەست بەجێ، دەم ودەست.

**دەسچەپەڵ:** دەستچەپەڵ، دز. ـــ ی: دەستچەپەڵی، دزی.

**دەسخاڵی:** دەست تەنگ، دەس تەنگی، دەست کورتی، هەژاری. ـــ بوون: دەست تەنگ بوون. پشوودان، ئاسوودەبوون. ـــ کردن: دەست تەنگ کردن، بێکارکردن.

**دەسخەت:** دەستخەت، دەستنووس.

**دەسخەرە:** دەستخەرۆ، فریودراو، تەفرەدراو، چارەڕێ.

**دەسخەرۆ:** تەفرە، لەخشتە.

**دەسخەرۆ:** دەستخەرۆ. ـــ بوون: تەفرەخوواردن. ـــ کردن: تەفرەدان. ـــ یی: دەستخەرۆیی.

**دەسخووەش:** ئافەرین.

**دەسخۆش:** دەستخۆش، بە یەکێک دەگوترێ، کە کارێکی باشی کردبێ، ئافەرین.

**دەسخۆشانە:** بەخشش، شاباش، خەڵاتێکە دەدرێ بەکەسێکی، کە کارێکی باشی کردبێ.

**دەسدار:** دەستدار، توانا، بەهێز. ـــ ی: دەستداری.

**دەسدانشۆرین:** دەست هەڵگرتن.

**دەسدان:** دەستدانە ناو دەستی یەکتری. دەست دان، بەرژەوەند و سوود تێدابوون.

**دەسداهێشتن:** دەست درێژکردن.

**دەسدرێژ:** دەستدرێژ. ـــ بوون: دەستدرێژبوون، دەستەلاتدار یا دەوڵەمەندبوون. ـــ کردن: دەستدرێژکردن، دەستەلاتدارکردن. ـــ ی: دەستدرێژی، زۆر و بێدادی.

**دەسرازە:** دەسترازە، (هەورا.) پێچەنە.

**دەسرە:** دەسترە، دەستەسر.

**دەسرۆک** (خۆ.): دەسرە، پێچی سەری پیاو و ئافرەتانە.

**دەسرەس** (خا.): دەسترەس، دەرفەت، کەڵێن، پەرژان.

**دەسرەش:** دەسترەش، بەدکار.

**دەسرۆکە:** دەستەسڕ. پارچەیێکی ڕەشی چوارسووچی تەنکی قەراخ سپییە.

**دەسرۆییگ:** دەستدرێژ، دەستدار، توانا.

**دەسرۆیین:** دەستڕۆیین، دەستدرێژی، توانایی.

**دەسرێژ:** شێلک، شێلنگ، تیرەباران، گوللەباران. ـــ ی: تیرەبارانکردن.

**دەسزەن:** دەس هەلبەس، ساختە، دروستکراو.

**دەسفرۆش:** دەستفرۆش، ووردەواڵە فرۆش. دەلاڵ. ـــ ی: دەستفرۆشی.

**دەسقەرز:** دەستقەرز.

**دەسقەنە:** باسقەنە.

**دەسقووچان:** دەستقووچان.

**دەسقووچاندن:** دەستقووچاندن.

**دەسقووچاو:** دەستقووچاو.

**دەسقووچیاگ** (ئەردە.): دەستقووچاو.

**دەسقووچیان** (ئەردە.): دەستقووچان.

**دەسقووچیاو** (ئەردە.): دەستقووچاو.

**دەسک:** جێگای دەست پێ گرتن وەکوو دەسکی خەنجەر و داس و ئیتر. قول، قولچە، گورز، چەپکە، چەپکەن، (هەورا.) دەسە، بەرچەق، (باک.) ساپ. دەسکی گوڵ و گژ و گیا و ئیتر، گوڵدەستە، قەفت. ـــ ی خەنجەر و شیر و چەقۆ و ئیدیکە، دەزگ جێگای دەست پێوەگرتن لە هەموو چتێک. قولفی باوڵی و سندووق و چەمەدانی و ئیتر. ـــ بێڵ و پێمەڕە و خاکەنداز و وەروەرە. کلکەبێڵ.

**دەسکار:** دەستکار، دەستکرد. ـــ ی (هەورا.): دەستکاری.

**دەسکاوونگ:** دەستاوون، جۆنی، سۆقی، هۆد.

**دەسکە** (ڕۆژ.): دەزوو، دەسکەگوڵ و گیاو ئیتر. فالق، دەستە بۆ هەموو چتێکی، ـــ باگردان، ـــ خەنجەر و شیر. ـــ جڵەو: دەستەجڵەو. دەستە جۆنی.

**دەسکەباگردان:** دەستەباگردان.

**دەسکەجڵەو:** دەستەجڵەو.

**دەسکەجۆنی:** دەسکەدزڵ.

**دەسکەچیل** (خۆ.، باد.): خەتیرە، چۆڵەچرا.

**دەسکەچیلە** (ڕەوا.): دەستەچیلە.

**دەسکەڕن:** گیاو دەغل ودان بە دەست ڕنینەوە.

**دەسکەڕێشمە** (موک.): ئەوەیە، کە لەسەر کەللەی وولاخی بەرزە و لا چاوەکەی دەخرێ.

**دەسکەڕیجە** (هەو.): مرازێکە لە کەرستەی چیکەنەیدا.

**دەسکەش** (ئەردە.): دەویت، گەواد، جاکێش.

**دەسکەفت:** دەسکەوت.

**دەسکەفتن:** دەسکەوتن، وەدەست هێنان.

**دەسکەن:** ـــ ی جگان: دەق، کەللا. پاڵەوان.

**دەسکەلە:** بوتری.

**دەسکەلەکەنیان:** دەست لە کەلەکە نان.

**دەسکەڵووجە:** جێی دەست پێوە گرتنی خەرەکێیە لەکاتی بادانیدا.

**دەسکەم:** لای کەم.

**دەسکەنە:** نیسک و نۆک و دەغلی بلاو بەدەستی ڕنینەوە، گوڵڕنینەوە. بۆ ڕنینەوەی خوری و موو و چتی تریش بەکار دەبرێ. چەپکەنە.

**دەسکەوان:** چتێکی قووڵە لە زەرد دادەڕێژرێ، ئاونک، هاوونک.

**دەسکەوە:** دەست شێن.

**دەسکەوت:** دەستکەوت، دەستکەفت، قازانج.

**دەسکەوتن:** دەستکەوتن.

**دەسکەوسار:** دۆخەفسار، دۆخی ڕێشمە.

**دەسکر:** دەستکرد.

**دەسکراوە:** دەستکراوە.

**دەسکرد:** دەستکرد.

**دەسکوتان:** دەستکوتان.

**دەسکوتانن:** دەستکوتان، لەپەکوتێ.

**دەسکودۆڵ** (کە.): (هەو.) جۆنی، بەردێکی قووڵە و بەردێکی درێژە گەنم و برنجیان پێ دەکوتی.

**دەسکوژ:** دەستکوژ.

**دەسکێش** (هەورا.): دەستکێش، دەستەوانە، دەسەوانە. ڕێبەر، ڕابەر.

**دەسکێشان:** دەستکێشان.

**دەسکێشانەوە:** دەستکێشانەوە، دەست هەڵگرتن.

**دەسکێش چەرم:** دەستەوانەی چەرم.

**دەسکیس:** دەستکیس. (باک.) یاریکار. ـــ ی: دەستکیسی، یارمەتی دانی یەکێکی بەدزییەوە. یاریکاری.

**دەسگا:** دەستگا، دەزگا، دەزگای کەوشدرووان. کارگە. ساختمان، دەسگاوبەرە، خانووبەرە.

**دەسگای ئاواز:** تەلەفۆن، گرامافۆن، ڕادیۆ، تەلەفیزیۆن.

**دەسگای تەن** (ئەردە.): دە چاوگەی دڵ: دیتن، بیستن، دەست لێدان، چێژتن، بۆنکردن، گومان، کەڵکەڵە، دەستەلات، بیرەوەری، لێدانی هاوبەشی.

**دەسگای جۆلایی:** کارگەی جولایی.

**دەسگر:** دەستگیر، دەزگر.

**دەسگرتن:** دەستگرتن، یارمەتی دان. هەڵپەڕین. (ئەردە.) ناوبران، دەزگیران.

**دەسگردان:** دەست بەدەست، دەست گەردان.

**دەسگرۆ:** یارمەتی، کۆمەگی.

**دەسگرۆیی:** دەسگیرۆیی، یارمەتی، کۆمەگی.

**دەسگۆچ:** دەستگۆچ، گۆچ.

**دەسگۆڕ:** دەستگۆڕ، بەقەستی.

**دەسگۆز:** دەسگۆڕ. ـــ ی: دەستگۆڕی.

**دەسگوشاد:** دەسکراوەوە، دڵفراوان، دەسباز. ـــ ی: دڵفراوانی.

**دەسگێڕ:** دێوەرە.

**دەسگیر:** دەستگیر، دەزگیر. قازانج. ئەوەیە، کە دەلاڵ دەیفرۆشی. یارمەتی دەر، کۆمەککار. دەستکەوتن، وەدەست کەوتن.

**دەسگیران:** دەزگیران، دەزیران.

**دەسگیرۆ:** دەزگیرۆ: ئەو پەڕۆیەیە، کە دیز و مەنجەڵ وئیتری لەسەر ئاوری پێ لادەبەن. ـ یی: دەزگیرۆیی، یارمەتی.

**دەسگیری:** دەزگیرۆیی.

**دەس لاخستن:** (ئەردە.) کەم فرۆشتن.

**دەس لەبانسەر:** هاودەرد.

**دەس لەبانسەربوون:** هاودەردبوون.

**دەس لەگەردن:** دەستەملان.

**دەست لەملان:** دەست لەملان.

**دەس لێداشتن:** دەست لێ شووشتن، وازلێ هێنان.

**دەس لێدان:** دەستدان، دەس پیاهاووردن، دەست پێداهێنان.

**دەس لێدریاگ:** دەس پیاهاوریاک، دەست لێدراو.

**دەس لێکێشان:** دەست لێ کێشانەوە، وازلێ هێنان.

**دەس لێکێشانەوە:** دەست لێ هەڵگرتن.

**دەس لێهەڵگر:** دەست لێ هەڵگر. ـ تن: دەست لێهەڵگرتن.

**دەسماشن:** لەپەکوتێی کوێر، دەستەکوتێی کوێر.

**دەسماڵ:** دەستماڵی ئافرەتان، لەچک، جوورە سەرپۆشێکی سێسووچی دورلادرێژە ژنان بەسەری خۆیانی دادەن و کچەکان لەشان و ملی خۆیانی دەئاڵێنن، بەستەیەکیش لەسەر دەسماڵێ هەیە.

**دەسمال:** دەسرە، دەستەسڕ، خاولی. (هەورا.) ئاغەبانوو، جامانەی سەر.

**دەسمال شەرمە** (ئەردە.): لەچک، چنراوێکە بەپێش زارییەوە هەڵدەبەسترێ لەبەربۆن و تۆز یا نەخۆشی.

**دەسماڵ گەردن** (ئەردە.): گەردن بەس.

**دەسماڵی سرکەیی:** سرکەیی.

**دەسمایە:** دەستمایە، مایە، سەرمایە.

**دەسمایەدار:** دەستمایەدار. ـ ی: دەستمایەداری.

**دەسمەرێز:** دەستخۆش، ئافەرین.

**دەسمەرێزانە:** دەستخۆشانە، دەسخۆشانە، خەڵات.

**دەسمز:** دەستمز، دەسمزد، مزی دەست.

**دەسمێز** (کە.): نێری کە جار و بار خۆی ئاسوودە بکات پێی دەڵێن ـ هەر وەکوو دەسپەڕ بۆ مرۆڤان بەکار دەبرێت.

**دەسمێژ:** دەستنووێژ.

**دەسمیز:** دەسمێز.

**دەسنەخوواردوو:** دەست لێ نەدراو، مۆرنەشکاو.

**دەسنەدار** (ئەردە.): دەسواز، دەس گوشاد.

**دەسنەقەس** (ئەردە.): بەقەستی.

**دەسنەویەردە** (هەورا.): دەستکورت، نەدیو.

**دەسنە:** دەستنە، چت بەمەردوم دانە بە ئەندازە و کەم و کووڕی.

**دەسنەخۆر:** دەستنەخۆر، کەسێکە هەر بەدەستنە چتی پێ بدرێ. ـ ی: ڕێ و ڕەوروشتی بەدەستنە چت وەرگرتن یا خوواردن.

**دەسنووانن** (ئەردە.): دەست و دەستەلاَت نیشاندان، خۆنووانن.

**دەسنووس** (هەورا.): دەستنووس، دەستخەت.

**دەسنووێژ:** دەستنووێژ.

**دەسنویس:** دەستنووس، نامە، دەستخەت.

**دەسنیانەکەلەکە:** دەست لەکەلەکەنان.

**دەس نیشان:** دەست نیشان، دیاری کراو. دروست کراو، دامەزراو، دانراو.

**دەسوادەس:** دەست بەدەست.

**دەسواز** (ئەردە.): دڵگوشاد، بەخشندە.

**دەسواکرد** (ئەردە.): تاڵووکە، پەلە، زوو.

**دەسوانە:** دەستەوانە، پەنجەوانە.

**دەسوەلاَ** (هەورا.): دەستبلاَو.

**دەسوەنەدای** (هەورا.): دەست لێدان.

**دەس و برد** (ئەردە.): دەست وبرد، زرنگی، قۆچاخی.

**دەس و برددار:** قۆچاخ، زرنگ.

**دەس و بۆس:** دەست ومۆچ.

**دەس و پا:** هەوڵ و تەقەلا، کۆشش. وابەسە، دەسەوبەسە، دەست و پێ، بەردەست، ژێردەست.

**دەس و پا بەستن:** دەست و پێ بەستن، کەتن پێکردن.

**دەس و پا گومکردن:** دەستە پارچەبوون، دەسەپاچەبوون، سەرلێ شێوان.

**دەس و پەنجەدان** (ئەردە.): دەس ومشتاق، سەرەتای زۆرانی گرتنێیە.

**دەس و پەیمان** (ئەردە.): بەڵێنی وگفت بەیەکتری دان.

**دەس و پەیوەن:** دەست وپێوەند.

**دەس و دەهەنە:** بەخشش.

**دەس و دڵدار:** دەست گوشاد، دڵفراوان، دەس ودڵواز.

**دەس و دڵواز:** دەس ودڵدار.

**دەس و دیم** (هەورا.): دەستنوێژ.

**دەسوور:** دەستوور، دالنگ، باو. (هەورا.) دەستوور.

**دەسووشک:** پیاوی ڕژد.

**دەس و قەڵەم:** خەت، نووسین.

**دەس و کار:** دەستکار.

**دەس و مشتاق:** دەس وبۆس، دەستی یەکتری گرتن لەسەرەتای زۆرانیدا.

**دەس و مۆچ:** دەست ومۆچ.

**دەس ووستەی دەلێ:** (؟).

**دەس ووشک:** نەگریس، چرووک، ڕژد.

**دەسووێنک** (جا.): دەستەوانەی مووروو و ئیتر.

**دەسهاڕ** (ئەردە.): دەستاڕ. (ئەردە.) بەدەست هاڕین. (هەورا.) ـ ە: دەستاڕ.

**دەسهاووردن:** پەیداکردن، وەدەست هێنان.

**دەسهاوورنەرێگە:** نەهێشتن، پێشگیری، پەک خستن.

**دەسهەرە** (ئەردە.): جوورە مشارێکی گچکەیە وەکوو چەقۆ دەنووشتێتەوە لقی گوڵی ناو باخی پێ دەبڕدرێ.

**دەسهەڵبەس** (ئەردە.): دەستهەڵبەست، ساختە، درۆ. دەست پێچەنە، دەست بەند.

**دەس هەڵپێکان** (ئەردە.): پەنجەهەڵپێکان.

**دەس هەڵگر:** (؟).

**دەسهەڵگرتن:** دەستهەڵگرتن، وازهێنان، پەنجە تێک هەڵکێشان.

**دەسهەوسار:** دەستەوسار.

**دەسی** (ئەردە.): دەستی، قەرز.

**دەسیار:** دەستیار، دەسیاو. ـــ ی: دەستیاری، دەستگیرۆیی، کۆمەگی، یارمەتی.

**دەسیاگ** (ئەردە.): پارێزگار.

**دەسیاو:** دەستیاو، دەسیار.

**دەسی دەسی** (ئەردە.): دەستی دەستی، تەفرە، ئەمڕۆ و سبەی پێ کردن.

**دەسینە** (فە.): بازنە.

**دەشە** (ئەردە.): دیمەن جووان.

**دەشەنین** (باک.): ئازاکردن. بدەشنە.

**دەشت:** دەرەوە، هەندەران، دەشتەو. چۆڵ، گۆڕەپان، بیابان، ئاران، پێن، مەخەر، بیاوان، (باک.) بەری، سەپاڵ. ـــ ی چۆڵ و بێ ئاوودان: کەمووش، نەبەرزی، نەپەنی، شوێنی چۆڵی تەختی رووتەن. جێگەرخوێن لای وایە: کە ـــ ڕاست و پانە، زاردەشت بەواتا ڕاستبێژ هاتووە چونکوو پێغەمبەر دەبێ ڕاست بێژبێ. کێڵگە، مەرزا.

**دەشتان:** دەشتانی. ـــ ی: جێگای تەختی پانی رووت و بێ دارودرەخت، دەشتایی.

**دەشتایی:** دەشتانی، شوێنی دەشت، هاماری، پادەشتی.

**دەشتەکی:** دانیشتووانی دەشتی و بیابانێ. بۆ گیاندار و گوڵ و داروبار و گژ و گیای دەشت بەکار دەبرێ، کە ماڵی نەبن.

**دەشتەو:** دەرەوە، دەشت.

**دەشتەوار** (موک.): دەشتەکی. ـــ ی: ژیانی دێهاتی و دەشتێ.

**دەشتەوان** (موک.): دەشتەکی، فەلەخووێ، جووت بەندە، (باک.) دەشتڤان. ـــ ی: دەشتڤانی.

**دەشتی:** دانیشتووانی دەشت، دەشتەکی، دەشتیانی، بیابانی، بیاوانی، چۆڵکەنشینی. جوورە مەقامێکی خۆشە.

**دەشتی کاکی بەکاکی:** دەشت و چۆڵ و بیابانێکی بێ پایانە.

**دەشنە** (هەورا.): قیمەکێش، چەقۆی قیمە.

**دەشۆ** (باک.): چڵکاو، ئاوێکە، کە ئامان و قاپ و قاچاخی پێ شۆرابێ دووای نانخواردنێ.

**دەشێ:** دەبێ، ئەبێ (بۆ کاتی دووا ڕۆژ)، سەر چاوەکەی (شیان) ە.

**دەشیا:** دەبوو، دەبووایە.

**دەعەجانی:** ناشیرین، دزێو، بێ ڕەزا، ڕەزاقورس.

**دەعبا:** بۆ گیانداری و زیندەوار و جانەوەرێک بەکاردەبرێ، کەناوی نەزانرێ.

**دەعبای کوویی** (هەورا.): داعبای کێوی.

**دەعجانی:** دەعەجانی.

**دەغەز:** دەردێکە وە دەردەباریکەی دەچێ، دەردی گران، ڕق، قین، ڕک، (هەورا.) دەغەڵ.

**دەغەزدار:** کەسێکە گرفتاری دەردی گران هاتبێ.

**دەغەل** (باک.): بۆژۆ، گیای بۆگەن و خراپ.

**دەغەڵ:** قومارباز، خرس، سست، ساختەچی، فێڵەزان، بڵح، چەپەندازە، بێکارە. ساختەچی، چەپەڵ، ناپاک.

**دەغەڵە** (ئەردە.): دەغەڵ.

**دەغەڵباز:** فێڵباز، ساختەچی، نادروست، داوباز.

**دەغەڵی:** خرسی، چەپەندازی، بێکاری، بڵحی.

**دەغدان** (باک.): (باک.) دەغدغان، مەگەنێ ئەزمێن، هێتم.

**دەغدەغان** (باک.): دەغدان، (باک.) مەگەنێ ئەزمێن، هێتم، (باک.) دگدگان، ئەستێرە قیبلەیە.

**دەغڵ:** دەخل، خەلە، گەنم و جۆ و هەمووجۆرە دانەوێڵەیەکە.

**دەغڵ ودان:** دەخڵ ودان، خەلە، دانەوێڵە.

**دەغمە** (ئەردە.): ئەشکەوت.

**دەغیلە:** داخڵی، چتێکە لەناو مێز و سندوقاندا پارەی تێدەکرێ. خەوش و خاڵ و شتێکە تێکەڵ بەچتێکی تر بووبێ، ئەم ڕۆنە ـــ ی تێدایە: واتە غەشی تێدایە.

**دەف** (باک.): دەفە، دایرە.

**دەفە:** مرازێکی ئاهەنگ و بەزمانە، کە لە بێژنگێکە چەرمی خاوی بە ڕوویەکی داگیرابێ تا بە پەنجەو لەپی دەست لێ بدرێ، دەفک، دەف. مرازێکە لە کەرەستەی جۆلاییی تەنراوی پێ سفت دەکەن، شانەی جۆلایی. بە ئێسکی شان وشەپیلکی گیاندارانیش دەڵێن.

**دەفەزکە** (ئەردە.): دەفزک، زگزل.

**دەفەژەن:** دەفەلێدەر.

**دەفتەر:** پەڕاوی.

**دەفتەرچە:** پەڕاوچە.

**دەفتەرخانە:** کارمەزەل، نووسینخانە، پەڕاوی خانە، نووسینگا.

**دەفتەردار:** پەڕاوی دار، نووسەر. ـــ ی: پەڕاوی داری.

**دەفتەرۆک** (باک.): پەڕاوی و پەرتووکی چکۆڵە.

**دەفر** (خێڵ.، کە.): جەواڵ و هەر چتێکی وەجەواڵی بچێ ـــ ی پێدەڵێن. پاکەت، قوتوو. (کە.) قاپ، ئامان، ئیربار، هیربار، قاپ وقاچاغ. پسدان (ڕەحمەی ژنان).

**دەفزک** (ئەردە.): مەردومی وورگن، دەفەزگ.

**دەفژەن:** دەفەلێدەر.

**دەفک** (باد.): دەفە. بەهۆی گریانەوە زار کەفکردن.

**دەفگەم** (زا.): ئاسن لغاوەکە دەکەوێتە ناو دەمی وولاخانەوە.

**دەفن** (باد.): کەپۆ، لووت.

**دەفیلە**: سان.

**دەفین** (کۆ.): دەمینی کووره و ئیتر.

**دەڤ** (باد.): لا، کن، نک، کەنار، جەم، ـــ ێ دەرێ (باک.) پێشـدەرکە، (باک.) زار، دەم، باوەڕیاوان لەسەردەم و لیڤانە، هەرچی دەڤێ تە دەگری ژمن بخوازە: هەرچی بەزارت دادێ لە منی بخوازە. ـــ ژێ بەردان: وازلێهێنان، بەجێ هێشتن. من ـــ ژ مالا خوەدا: ئەمن ژنی خۆم بەرەڵا کرد. ـــ لێکرن: گەزتن.

**دەڤار** (باک.): دەوار، ووڵاخ.

**دەڤە** (زا.): لۆک (ووشتری نێر).

**دەڤەدەشتی** (زا.): تەپاڵەکێویلە.

**دەڤەدیس** (باک.): جووره گەنمێکە.

**دەڤەر** (زا.): دێزەی دەمی تیغ، شوێن.

**دەڤبگۆتن** (باک.): پەیمان ڕاگر، ئەمەگدار، پەیمانپەرست، خاوەندی قسەی خۆی.

**دەڤتەر** (باک.): بەخشندە، دڵفراوان.

**دەڤتەرک** (باک.): بەبەزەیی، بەزەیی دار.

**دەڤتەری** (باد.): سەوزەوات.

**دەڤتەزی** (باک.): لاف لێدەر.

**دەڤتێن** (باک.): داوێن، کێشان.

**دەڤخۆر** (باد.): دەستەڵات بەسەر ئەم و ئەودا.

**دەڤدەڤی**: دەمدەمەکی، وازی وازی.

**دەڤدریا** (باک.): زۆربلێ، زاردراو، چەنەدرێژ، ڕاز ڕانەگر. ـــ یی (باک.) زۆربلێ یی، زاردراوی، چەنەدرێژی، ڕازڕانەگرتن.

**دەڤرووت** (باک): قسەڕەق، بێ شەرم. (باک.) ـــ ی: قسەڕەقی، بێ شەرمی.

**دەڤسەک** (باک.): قسەخۆش، زمان شیرین، ڕووخۆش. ـــ اهی (باک.) قسەخۆشی، زمان شیرینی، ڕووخۆشی.

**دەڤشۆ** (زا.): ئاڤشۆ.

**دەڤشێر**: زارهەژدیها (گۆڵ).

**دەڤڤێ** (ژە.، سوور.، بۆتا.): ووشتر.

**دەڤک** (باک.): سەرپۆش، دەم ئاخن. ـــ دانین: داپۆشین، سەرنانەوە.

**دەڤکەنۆک** (باک.): دەم بەپێکەنین، لێوبەزەردە.

**دەڤکەنی** (باد.): زەردەخەنە.

**دەڤگەرم** (باک.): هاندران. (باک.) ـــ ی: هاندان.

**دەڤگر**: زارگر، ڕاز ڕاگر، ڕاز پارێز، دەڤگرتی.

**دەڤگرتی**: دەڤگر.

**دەڤلەتا سەرێ خۆ** (باک.): بەخێرا خۆت، سندووقی سەری خۆت.

**دەڤلخووین** (باک.): خووێنرێژ. (باک.) ـــ ی: خووێنرێژی.

**دەڤلکەن** (باک.): بەزەردە، شادمان، ڕووخۆش.

**دەڤلنگ** (باک.): (باک.) دەرلنگ، دەلینگ.

**دەڤلۆک** (باک.): زیندەوارێکە بگەزێ.

**دەڤمری** (باک.): بێ دەم وپل.

**دەڤنەرم** (باک.): میهرەبان، ڕووخۆش. (باک.) ـــ ی: میهرەبانی، ڕووخۆشی.

**دەڤنخووین** (باک.): وەرگێردراو، دەمەونخوون.

**دەڤۆش** (باک.): ئاوی پیس، شلوێ.

**دەڤی** (زا.): داری گچکەی لێک نزیک، دەوەن، دار ودەڤی: دار و دەوەن. (باک.) بیر، چاڵاو.

**دەڤێک** (زا.): کلکی ووڵاخان.

**دەق**: هەروەک خۆی، هەروەک، تەق، دەمنی، (هەورا.) پێستەنە. ـــ کردن (ڕۆژ.) قەدکردن. جووان، شەنگ، کچێکی دەقە: واتە جووانە. قەدی چتی قەدکراو. کەیف، منداڵەکە زۆر بە دەقە. تەوا، لە سابلاخەوە بە سێ ڕۆژی دەق گەیشتمە سەر دەشت. (زا.) میچ. ئەندازە، پایە، ئازدار لە دەقی خۆیدا ماوە. گیان لەبەرێکی قەڵەو و بەهێزە، ئەسپەکەت بە ـــ ە. (باک.)سەخت، بەهێز. (باک.) ئێسکی چکۆڵە. ئەنگوستیلەی دروومانێ. جووانی، شۆخی، ووتوو.

**دەقا** (ڕۆژ.، هەو.): دەسکەلا، کەللا، جگی گەورە، لەجگێنی و مەرمەڕێنیدا.

**دەقاق**: شۆ و کالا و چتی چنراو و تەنراو، (ئەه.) ئاش، کەتیرە و جیوەی دارانە کە شۆی چتی تەنراو و چنراوی پێدەدرێ.

**دەقاقدار**: دەقدار، شۆدار. ـــ ی: شۆداری.

**دەقاقدان**: شۆدان، ووتووکردن، قەدکردن بەرێکی و لووسی و بێ گنجی و لۆچی.

**دەقاقدانەوە**: دووبارە بێژانەوەی دانەوێڵە بە بێژنگ بۆ وورده لێ بڕینی. کوتانەوەی برنجی نیوەکوتراو. لێدان.

*

**دەقاقلی**: دەق دراو.

**دەقانە** (باک.): گوللە.

**دەقاندن** (باک.): خاڵ کوتان، بدەقینە.

**دەقاندی** (باک.): خاڵی کوتراو، خاڵدار.

**دەقاودەق**: دەق، تەق، هەروەک. ڕاستەوخۆو بێ کەم و کووڕی، پارەکەم بەسەر هەژاراندا دابەش کرد ـــ دەرچوو.

**دەقە**: هەر.

**دەقەروو** (باک.): ڕووبەڕوو، ئاشکرا.

**دەقەقاندن** (زا.): خوتووکەدان، قدیلکەدان.

**دەقەل** (باک.): چەقێن، زەوی ڕەق.

**دەقەنە** (باک.): قەت مەبە، (باک.) قەت نەبە.

**دەقبەستن**: دەق گرتنی چتی قەدکراو.

**دەقدار**: دەقاقدار.

**دەقدان**: ڕێکخستن، ووتوو لێدان، مووچاندنەوە. (باک.) خاڵکوتان.

**دەقدانەوە**: دووبارە بێژانەوەی دانەوێڵە بە بێژنگ بۆ وورده لێ بڕینی، دووبارە کوتانەوەی برنجی نیوەکوتراو. بۆ لێدانی کەسێکیش بەکاردەبرێ، کە ئەمرۆ نەچییە قوتابخانە دەقت دەدەمەوە.

**دەقدانانش** (دەر.): ژووری دانەوێڵە.

**دەقدەق** (برا.): خاڵخاڵ، پەڵەپەڵە، پنک پنک.

**دەقدقاندن** (باک.): قدیلکەدان.

**دەقدەقە** (ئەردە.): پرتەپرت، بۆڵەبۆڵ.

**دەقدقین** (باک.): قدیلکەدران.

**دەقساندن** (باک.): چاو پۆشی، خستنە پشت گوێ.

**دەقشکان**: ژاکان، گەچران. ـــ دن: ژاکاندن، گەچراندن.

**دەقکردن**: قەدکردنی کەل وپەل.

**دەقکراو**: چتی قەدکراو.

**دەقگرتن**: باش نوشتانەوەی چتی قەدکراو بەچەشنێ، کە شوێنی دەقەکەی دیاربێ. نەگۆڕان و هەروەک خۆی مانەوە، نرخی گۆشت لەم مانگەدا دەقی گرتووە، واتە نەگۆڕاوە.

**دەقل** (زا.): شوێنی زۆر سەخت لەمزەوی نەکێڵراو.

**دەقلووس** (باک.): پەڕین، بازدان، هەڵبەزینەوە، سەرمەقولاّت.

**دەقلووک** (زا.): مازوو.

**دەقن** (دەر.): زەنەکاو، زنە، زەنەک، جێگای ئاودار و قوڕو لیتاو. ڕاتبە، نان و چێشت چنینەوەی فەقێ و سوختان.

**دەقنە**: دانەوێڵەیەکە سوختە و فەقێیانی مزگەوت بۆ زستانیانی کۆ دەکەنەوە.

**دەقۆر**: مەڕێکە، کە خورییەکەی، لە نێوانی خوری و کورکی دابێ. بزنێکیشە کە مووەکەی لە نێوانی مەرەز و موو دابێ.

**دەقۆریا**: ئێلێکی کوردە پایتەختی وان شاری (ئامودی) یە، تاکۆڕا، تاکۆریا: ئێلێکی مەزنی کوردە لە ژووروی کوردستانی بندەستی ترکاندایە دەڵێن هەردووک ئێل ئامۆزای یەکترین.

**دەقوور** (باک.): مەڕێکە لە جسنی ناوونجی.

**دەقیقە**: چرتە.

**دەک**: ئەک، هەک، یاخوا، خۆزی، خۆزگە، کاشکی، دە، ـــ بەقوربانت بم، ـــ دەستت خۆشبێ. ووشیار بە، ها، هاها، ئەک، ئاها، هۆشیار بە. ـــ (باک.) بەلاّم. دەک و دۆلاّب پێکەوە بەکاردەبرێن، فێل، ساختە، ناز. نزیک بوو: ـــ وەختە بوو لە نیشانەکەی بدا.

**دەکەڵ** (ئەردە.): بێ ڕیش، بێ تووک.

**دەکدەک** (ڕۆژ.): ئاگادار بە، هاها، ووشیار بە، (موک.) دەک.

**دەکرا** (باک.): تەپڵ، دەهۆڵ.

**دەکن** (کە.): ئەتک، شکاندنەوە.

**دەکوو** (هەورا.، کۆن): کاوور.

**دەکوودیم**: ڕوو، ڕوخسار، چارە.

**دەکووش** (زا.): بێشکەی منداڵ.

**دەگا** (هەورا.): دێ، گوند، لادێ.

**دەگەر**: لێ هاتنی کاری زل و گرنگ لە یەکێک و ڕەوایی فەرمانی، فیسارەکەس بە دەگەرە.

**دەگەل** (باک.): ووشیار، هۆشیار، دووربین، (زا.) گاڵتە.

**دەگەڵ**: لەگەڵ، دگەل، ڤیرە، (باک.) پێرە. ـــ یەک: پێکەوە. (ئەردە.) ناخووای کەشتی.

**دەگەنەک**: زۆر، زۆرداری، بەـــ کارت پێ دەکەم (واتە بەزۆرداری).

**دەگمە** (زا.): دەگمەن، هەڵکەوت.

**دەگمەن** (بابا.): هەڵکەوت، نایاب، بەـــ ئاوی لێ پەیدا بووە یا دیتراوە.

**دەڵ**: دەڵەدەڵ، نێزیکی زان، (کە.، هەورا.، فە.) دێل، ـــە سەگ: دێڵەسەگ، بۆ هەموو مێینەیەکی سەگ و گورگ و چەقەڵ و ڕێوی دەست دەدات.

**دەل** (ئەردە.): گیانداری ڕووقایمی ئازا.

**دەلاڤ** (باک.): ئاخوڕ. ئاودڕ، گەڕ، لەنگەرگای چکۆڵە. دەراو.

**دەلاقە**: کونی گەورە لەدیوار. دەرکە، دەرگا. (هەورا.) پەنجەرە و دەرکەی گچکە. تاقە، لەپ. ڕەوزەنە، کونی دیواران. (باک.) بەرکاز، پەنجەرەیێکی چکۆڵەیە لەسەرەوەی دیواری لەنزیک میچی بۆ دووکەڵ و ڕووناکی، کوڵێتان. ڕۆچنە، کولانە.

**دەلاک** (ع.): سەرتاش.

دەلاک

**دەلاکخانە**: سەرتاشخانە.

**دەلال** (باک.): ناوی پردێکی کۆنە لە شارۆچکەی زاخۆ. نازدار، دڵبەر، فریوباز، جووان، نەخشین، خۆشەویست. جامباز، جانباز، ناوچی.

**دەلاڵ**: کەسێکە کەل و پەلی نووێ و کۆنەی ئەم و ئەو بفرۆشێ. ڕابەر، دەستکێش.

**دەلاڵانە**: مافی دەلاڵی، مزێکە بە دەلاڵ بدرێ، مزی دەلاڵی.

**دەلاڵەت** (ئەردە.): سەرەخۆشی، پرسە، دڵنەوایی، دڵداری.

**دەلاڵخانە**: شوێنێکە دەلاڵان چتمەکی کۆنە و نووێی تێدا بفرۆشن.

**دەلالی** (باک.): جووانی، قەنجی، ئالووسی.

**دەلاڵی**: ڕابەری، دەستکێشی، بوونەدەلاڵ، پیشەی دەلاڵ.

**دەلان**: دەلاندن، تنۆک تنۆک و نمی تەڕایی لە دەفرو کووپە و دیزە وگۆزە و ئیتری تازە هاتنەدەر، نمدان، تەڕایی دانی دیزە وگۆزە و کووپە و چتی لە گڵ دروستکراوە، بۆ حەوزیش بەکار دەبرێ.

**دەلانە** (کە.): نم، شە، شی.

**دەلاندن**: ئاو لەبەر چوون، لێچوون، ئاو لێچوون، بە دیزە و گۆزە و هی وا دەڵێن کە بە ئەندازەیێکی نم و شەی بداتە دەرەوە ئاوی تنۆک تنۆک لەبەر بڕوات، دادان، دەردان.

**دەلانن**: دەلاندن.

**دەلە** (ئەردە.): لێی دە، بدەلێی. (ڕۆژ.) قاوەدان، گومگومەی ئاوێ.

**دەڵە** (هەورا.) دێڵەسەگ. (موک.) گێژ و وێژی، سەرگەردانی.

**دەڵەبەبا** (هەورا.): دێڵەبەبا، سەگێکی مێ یینەیە کەهاتبێتە باو گۆلی ڕەدووکەوێ.

**دەڵەچە**: مرۆڤێکی سووک و نزمە کە مێچکە مێچکە بۆ ئەم و ئەو بکا.

**دەڵەچەک** (کە.): ماستاوکەر، ڕیایی کەر، مەرایی کردن، خووەلی دانین.

**دەڵەچەیی**: نزمی و سووکی و مێچکە مێچکەکردن بۆ ئەم و ئەو.

**دەڵەدەڵ:** باری نزیک زانی ئافرەتانە، لەسەر دەستان، دەڵ، لەسەرزان. زەردبوون و نەرم بوونی دومەڵ بەرەنگێک کەکاتی دەربوونی هاتبێ. قوونێرو دومەڵێکە گەیشتبێ و نزیکی دەربوون بووبێ.

**دەڵەسە:** درۆ، ساختە، فیشاڵ، چاخان، ـــ کردن.

**دەڵەسەگ:** دێڵەسەگ.

**دەڵەشیر** (ئەردە.): کچ، کەنیشک.

**دەڵەشێر** (ئەردە.): شێری مێ.

**دەڵەق:** دێڵە بەبا.

**دەڵەک:** (ئەردە.) دەلە، دەلەک، (شەم.) کـووژە، کووشک، داعبایەکی سووری تۆخە کەوڵەکەی زۆر بەنرخە گۆیا چەکی بەربەرەکانێتی وی لـە دوژمن تەنها (تسە) چونکوو دەڵێن بۆ فسی ـــ ی زۆر ناخۆشە، هەر وەکوو دەڵێن گەورەترین چەکی کیسەڵ لـە بەرەنگاری دوژمنـدا تەنهافسـە. دێڵەبەبا.

**دەڵەکدان** (لو.): پاڵپێوەنان، (دەڵەکدە) واتە پاڵی پێوەنێ.

**دەڵەکردن:** کەنەفتکردن.

**دەڵەمە:** ـــ ی شیری: (هەر.) گیوی، شیرێکە لەبەر کەمکوڵاندنی ترش نەبووبێ و کەمێک مەیی بێ. ـــ ی هێلکەی: دلمەی، دەڵـەمێ، دۆڵـەمێ، واتە هێلکەی نیوە برژاو.

**دەڵەمێ:** هێلکەی نیوەبرژاو، دەڵـەمە.

**دەڵەمیز** (ڕۆژ.): چرتە میزە.

**دەڵەوەسـان** (فـە.): وەدوواکـەوتنی چـەند گۆڵـەسـەگێکە بەشـوێن دێڵەسەگێکیدا.

**دەڵەب** (ڕۆژ.): فلت، بلاّو، فش، جلکی فش و فراوان، پێڵاوی فش.

**دەڵەپ:** دەڵەب.

**دەڵەپ و دۆپ:** چتی زۆر دەڵەپ.

**دەڵقین** (زا.): ئابڕووچوون و نەمانی شەرم.

**دەڵە** (زا.): جبە. (ئەردە.) دەڵـەمە.

**دەڵ مەمکا** (باک.): ئێلێکی کوردە.

**دەڵنگ:** دەلینگ، دەرەلنگ. (زا.) دەرپێ.

دەڵۆی خاڵ

**دەڵۆ:** شێت، کاس.

**دەڵۆی خاڵ:** چقر (خاچ).

**دەڵۆیی:** دەڵوو.

**دەڵوو** (باک.): پاڵەوانی، مرۆی کەمهۆش، ئـاقڵ سووک، دەسوەر، هەرزەچەنە.

**دەڵووبیبەر:** جووره بیبارێکی زۆر توند و تیژە بەتەڕی پتر بـە ترشیاتەوە دەخورێ بۆنیشی وەکوو نیسیوەت وایە، کە زۆر ماوە سوور هەڵدەگەڕێ.

**دەڵووجە:** بیباری سوور.

**دەڵوودلێر** (ئەردە.): ئازا، دڵقایم.

**دەڵووف** (باک.): سەتڵی چەرمە.

**دەڵووقەڵ:** مرۆی ڕووهەڵماڵراوی ئازای چەنبازە.

**دەڵووکار:** نیوە شێت، گێژ و وڕ.*

**دەلیا:** زۆر، دارا ـــ یەک دەخووا. دەریا.

**دەلیالووش:** مەبەس لەمزۆر خۆر و چاو برسییانە.

**دەلیان:** سەرسام و سەرگەردان بوون، واق وورمان، (ئەردە.) دملاّنـدن، ئاودەردان.

**دەلێکە** (هەورا.): دەڵەک.

**دەلێ لێ:** دەلۆلۆ، (یەز.) ڤێکالۆلۆ، لەگۆرانیاندا بەکاردەبرێت.

**دەلێم:** دەبێم، دێژم، دەیێژم، دەبێژم، میشم، (بابا.) ئـەڵێم، (ژاوە.) بوواچۆ. مووواچم، (دەر.) ویشم، (هەورا.) ماچۆ، ئەووشم، دەووشم.

**دەلێی:** ئەلێی، (خا.) ووشی، (دەر.) ویشی، (هەورا.) ماچی، چما. ئایا لات وایە کە، ئایا پێت وایە کە.

**دەلیوومـان** (زا.): کەسێکە لەسەر زەوی لاسایی پاڵـەوان بکاتـەوە لـە کاتی تەنافبازیدا.

**دەلیف** (باد.): دەرفەت، دەرەتان.

**دەلیقانی:** ئافرەتی بێ شەرم.

**دەلین** (باک.): واق وورمان، سەرگەردان بوون.

**دەلینـگ:** (فـە.) دەرپـا، دەولینـگ، (هـەورا.) دەرەلنگ، دەڤلنگ، (کەل.، هەورا.) دەرقاچ، دەرقاچێ، دەلنگ. ـــ ی هـەڵپێچراوی ژنـە هەرکیان: باڵۆرە.

**دەم:** (هـەر.) زار، دم، دەو، (باک.) دەڤ. بە ـــ : شەهتۆت، دەمـەوەر، دەم هەراش، بەدەم وپل، بەزمان، بەدەم و دوو. لە ـــ دانـەوە: نەهێشتن، بەربەستکردن. بە ـــ دادان (ڕۆژ.): بەربەستکردن، گرتنەوەی مـاین لـە تاوی غاردانێدا. (باک.) بیست، بهن، تاو، تاف، چاخک، حەل، هەل، چاخ، قاس، کات، گاڤ، (هەورا.) هەنگام. ژووم، کێلی، گاو، نشک، بێن. ئەودەمی. هندی، هنگی، هنگینی، هنگاڤی، هـەنگێ، هـەینێ، هەنگینێ. ـــ یکی دی: کاتێکی تر، کێلیکەدن. ـــ یکی: تـاوێکی، قاسکی، کـاتێکی. ـــ دی: گاڤـادی. ئەو ـــ ەی: (فە.) یەمە. ـــ دان: (باک.) بووخاک. ـــ کێشان: پێگەیشتنی چاوچێشت، ڕەنگدانـەوەی چایە. دەمـەگوویزان، دەمەچەقۆ، دەمەخەنجەر، واتـە گوویزان و چـەقۆ و خەنجەری بێ دەسک، زارک، کونی چتی، سەرەتا، هەوەڵ، ـــ ی بـەیانی، کوورە (هەمبانەی) کوورەی زێڕینگەر و ئاسنگەر و نیتر. ـــ ی تیغ: زار و لێواری تیغ. بە ـــ ەوەچوون: پێوەچوون. ـــ ابوری (باک): دەمی ڕابردوو. ـــ انهۆ (باک.): ئێستا. ـــ اپاشین (باک.): دەماپاشـینێ: دووارۆژ، دەماپاشییێ. ـــ اکۆ: کاتێکی. گیادەمی داوە: سەری دەرخستووە.

**دەماخ:** کـەیف، خـۆش، شـادمانی، شـادی، بـەزم، ئاهـەنگ. بـە ـــ : شـادمان، کـەیفخۆش، بەکـەیف. لـە ـــ دان: سەرداسـەر و گراوبـوون. تووڕەکـردن، تووڕەبـوون. ـــ شـکان: دەق شـکان، کـەیف تێکچـوون. میشک، مەژی، (ڕەوا.) دەردێکی وولاّخانە کە ئالیکیان لەکاتی خۆیدا نەدرێتێ تووشی دەبن. (ئەردە.) لـووت، کەپۆ، دفـن، دارا ـــ ی خـۆی کردووە، واتە لووتی خۆی هەڵبەستووە.

**دەماخ پروانن:** لووت پرواندن (گلۆفتن).

**دەماخ تەختکردن:** مەبەس لـە هەوەس تەخت کردن و خۆگیف کـردن بەسـەر ئەم و ئەودا.

**دەماخ شکاندن:** خۆشی لەیەکێک تێکدان.

**دەماخکردن:** کەیف و خۆشی کردن. لووت هەڵبەستن.

**دەمادەم:** دەمدەمە. (ئەردە.) هەڵاتنی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە، سەرەتا، بەرایی، هەوەڵ.

**دەماخ هەڵبەستن:** کەپۆ و لووت هەڵبەستن.

**دەماخ هەڵدان:** کەپۆ و لووت هەڵبەستن.

**دەمار:** ڕەگ، شارەگ، ڕەگی گەورە، دامار. ناموسپەرستی، ئازایی، (هۆر) کەیفەرات، زات، هۆرە، پرکێشی، زاخ. بە ـــ : ئازا، دلێر. بێ ـــ : سلۆرت. ـــ سست: سلۆرت. هەوا، فیز، فیسارەکەس زۆر بە ـــ ە. دارکی تووتنییە، دارک، ڕەگ و ڕیشەی داران.

**دەمارەکوڵ:** دوورپشک، چزەوپێڵە.

**دەماردار:** بەدەمار، ئازا، چاونەترس. ـــ ی: بەدەماری، چاونەترسی.

**دەمارەدەرهاتن:** مەبەس لەتین و توانایی لێ بڕان، زۆر هەراسان بوون.

**دەمارەدەرهاووردن:** دەمار دەرهێنان، ڕەگ و ڕیشەدەرهێنان.

**دەمارسست:** حیز، ترسەنۆک. ـــ ی: حیزی، ترسەنۆکی.

**دەمارگیران:** تووڕەبوون، قەڵسبوون.

**دەمارگیراو:** تووڕە، قەڵس.

**دەمارگیریای** (هەورا.): دەمارگیران.

**دەماروەرگەڕان:** (ڕەوا، خۆ) جەمام.

**دەمارهۆرگێلای** (هەورا.): دەمار وەرگەڕان.

**دەماغە:** لووتە (خاکێکە لەدەریا چووبێتە پێشەوە).

**دەمامک:** لچکی پێچ یا چتێکی تر. ـــ دان: لچکی پێچ یا چتێکی تر لە دەم و گەردن ئالاندن.

**دەمان** (موک.): دامان، دەستەبەری. بە ـــ گرتن: وەخۆگرتن، گرتنە ئەستۆی خۆ. ـــ بوون: بوونەدامان، وەخۆگرتن.

**دەمانچە:** (هەو.) شەش ئاگر، دەبانچە، دەوانچە، چەکێکی گچکە وەکوو تفەنگ گوللەی پێ دەهاوێژرێ و زۆرتر کارەساتی ناڕەوای پێ ئەنجام دەدرێ.

دەمانچە

**دەمانچەساز:** دەمانچە دروستکار، دەمانچە چاک کەرەوە، جەخسی. ـــ ی: پیشەی دەمانچە دروستکردن و چاک کردنەوەی.

**دەماندن:** دەفاندن، گەشاندنەوەی ئاگر بە مووشەدەمە. ـــ کوورە.

**دەمانگەهە:** ئاسایی.

**دەمانن:** دەماندن.

**دەماوەر:** دەمەوەر.

**دەماوەڵ** (شار.): کەنارئاو، لێواری ئاوێ.

**دەماودەم:** چتێکە زار بەزار بگێڕدرێتەوە. جاربەجار، زووزوو، پەیتاپەیتا. دەست بەجێ بە بێ درەنگی.

**دەماودەم کەوتن:** بەسەر ڕووداکەوتن، بەڕووداکەوتن.

**دەمایەم:** دەماودەم.

**دەمایی:** دوایی.

**دەمە** (ئەردە.): مۆدنە، دارجغارە. (موک.) جوورە درووەمانێکە. ـــ ی کڵاو: چینێکی پەنجەرەدارە لەنێوانی تەپە و کەڵلەی کڵاو و ئارەقچناندا. ڕۆژی باو و بۆران، توّف و بارانە. دەمە تیغ و چەقۆ. کوورەی ئاسنگەری، ئەو کەرەستەیە کە زێرینگەر و ئاسنگەر و مسگەران و پیشەسازان ئاوری پێ گەش دەکەنەوە، مووشەدەمە.

**دەمەت** (کە.): تووتنی ڕێکخراو و لەسەر یەکتری دانراو و ڕیزکراوە، (باک.) بەستەیەک تووتن.

**دەمەتەقێ:** ووتوویژ، دەمەقرێ، دەمەقاڵە، گفتوگۆ، پیلە. دەم تەقاندن.

**دەمەتەقێن:** گوفت و گۆکردن، چەنەبازی، زۆر بڵێ یی.

**دەمەترشتە** (ئەردە.): تۆلاشە، تەلاش.

**دەمەتیغ:** تیغی بێ دەست.

**دەمەجاو** (ئەردە.): زارجوو، دەمەجوو.

**دەمەجوو:** زارجوو، ئەوەندە بنیشتەیە کە دەیخەنە ناو زارو دەجوورێ.

**دەمەچەقۆ:** چەقۆی بێ دەسک.

**دەمەداچەقێ:** زارلێک بوونەوەی کەسێکییە لەکاتی گیانەلادا کە هەناسەی درەنگ دەردەچێ، زار دا چەقاندن. گیاندان، چەنەگە هەڵتەکاندن.

**دەمەدەم:** سەرەتای هەموو کاتێک. ـــ بەهاران و پاییزان خۆشە.

**دەمەرقۆپان** (بابا.): پانتۆڵ.

دەمەرقۆپان

**دەمەسوو:** سوونەوەی تیغ دوو جوورە یا بە پانی دەسوونەوە یا تەنها سەرەوەی لای دەمەکەی دەسوونەوە، سوونەوەی لای دەمەکەیەتی کە بە ماوەیێکی کەم ماوەی تیژکردنی کورت دەبێتەوە دەبێ دەمە زەرد بکرێ واتە ئاسنگەر تەنکی دەکاتەوە.

**دەمەرێزە:** تیغێکە دەمی هەڵوەری بێ و برشتی نەمابێ. ـــ بوون: هەڵوەرینی دەمی تیغ.

**دەمەزەردە:** مەبەس لە تیغێکییە دەمی هەڵوەریبێ و سەر لە نوێ ئاسنگەر پۆلاێیای بکات و تازەی بکاتەوە، پۆلانیا.

**دەمەزەردکردنەوە:** تیژکردنەوەی دەمی تیغانە بە برەند لەگەڵ ئاودانەوە.

**دەمەزەن:** دەمە زەرد. *

**دەمەشێر:** زارەهەژدیها، جوورە گوڵێکە.

**دەمەق** (ئەردە.): واق، مات، سەراسیمە.

**دەمەقاڵە:** (باک.) شووڤک، شوولک، پیلە، پیلەبازی، دووگوورزە، شەڕەقسە، دەمەتەقێ، مەرشە، هەڤچووم، بەردەق، دەمەقرێ، دەمقالی، دەمقرە. بە ـــ هاتن: تێک گیران.

**دەمەقرە:** دەمەقاڵە، دەمقرە.

**دەمەقرێ:** دەمەقاڵە، دەمەتەقێ.

**دەمەکردن:** پەنجەرەی نێوانی تەپە و کەڵلەی ئارەقچنان بەزنجیرەکردن.

**دەمەکوتێ:** ووڕتە ووڕت، بۆڵەبۆڵ. ـــ کردن: بەدەم ووڕتە ووڕت کردن. دەمەداچەقێ.

**دەمەکی:** سەرپلکی، سەرپێنی.

**دەمەگری** (فە.): لیک، کەف و کوڵی زار.

**دەمەگوێزان:** ئەو دەمە چەقۆیانەیە کە لەناو ماکینەی تراشێدا ڕیشی پێ دەتاشرێ.

**دەمەڵ** (باک.): بەروو.

**دەمەلاسکانێ** (دەر.): لاسایی.

**دەمەلاسکە:** لاسایی کردنەوەی قسەی یەکێک و دەم لێ خوارکردنەوە لە رووی قەشمەری و پێکەنینەوە.

**دەمەلاسکێ** (ڕۆژ.، کۆ.، جا.): لاسایی، تەنها بۆ زار و زمانە.

**دەمەلاَن** (ئەردە.): کارگ.

**دەمەڵبێن:** پارچە خام یا پەڕۆیەکی تری درێژکۆڵەیە زاری مردووی پێ دەبەسترێ لە کاتی کفن کردنیدا.

**دەمەنە** (ئەردە.): دەمنە، دارجغارە، مۆدنە.

**دەمەنی** (جا.): پەسیو، هەلاَمەت.

**دەمەوەر:** دەمهەراش، بەدەم وپل، بەزمان، چەنەدرێژ. ـــ ی: دەمهەراشی، بەدەم وپلی، بەزمانی، چەنەدرێژی.

**دەمەوچوون** (ئەردە.): پێشوازکردن.

**دەمەوخووار:** چتی دەمە و نخوون، سەرەوخووار.

**دەمەوخووارکەفتن:** سەرنخوونکەوتن.

**دەمەوخووارکەوتن:** دەمە و رووکەوتن.

**دەمەودەم:** زاربەزار، دەم بەدەم.

**دەمەورووو:** دەمەوخووار، لەپەوروو.

**دەمەورووکەفتن** (ئەردە.): لەپە و رووکەوتن.

**دەمەوژوور:** سەرە و ژوور.

**دەمەوژێر:** دەمەوخووار، سەرەوژێر، سەربەرەوخووار.

**دەمەونخوون:** دەڤنخوین، دەمەوخووار، سەر بەرەوخووار.

**دەمە و نخوون بوون:** قلْپ بوونەوە.

**دەمەونخوونکردن:** قلْپ کردنەوەی ئامان و دەفر.

**دەمەونخوونکردنەوە:** سەرەوژێرکردنەوەی دەفر.

**دەم بەدەم:** جارجارە، جاروبار. هەمیشە، هەرگاڤ. زاربەزار.

**دەم بەردان:** چەنە درێژی کردن، خراو ووتن.

**دەم بەس:** دەمبەست، بەلاَمک. پەتێکە دەمی گاجووتی پێ دەبەسترێ لە کاتی گێرە کردنیدا تا هیچ نەخوات یا هی سەگی پێ دەبەسترێت.

**دەم بەست:** زاربەست، زاربێن، زارەوانە، دەم بێن، بەلاَمک، بزموک بۆ کار و بەرخ و هی وا، پەتێکیشە لەکاتی گێرەدا دەمی گای پێ دەبەسترێ. جادوو.

**دەم بەستن:** زاربەستن، بەرتیلدان.

**دەم بەیەکاهاتن:** زاربێکداهاتن، ژاوەژاوکردن.

**دەم بڕ:** گریان، وەبگرە، بەگۆترە، گۆترە.

**دەمبوون:** دەمکێشانی چاو پلاَو و قوبوولی.

**دەم بوونە تاقی چرا:** بۆ یەکێک بەکاردەبرێ کە لەبەر واق وورمانێکی کوتوپڕی نەتووانێ بدوێ.

**دەم بوونە تەڵەی تەقیو:** دەم بووەتە تەڵەی تەقیاگ، دەم بوونە تاقی چرا.

**دەم بێن** (موک.): ئالقەدارێکی خڕە لەزاری وولاَخانی گێرەی دەکەن، بزموک. دەمبەست، زاربێن، زارەوانەی هەمبانە و خیگە و ئیتر.

**دەم پووچ:** دەم پووچەڵ.

**دەم پووچەڵ:** مرۆڤی بێ ددان. ـــ ی: بێ ددانی.

**دەم پوخت:** چێشتێکی شلەیە لە کشمیش و لەتکەنۆک و کفتەی وورد دروستدەکرێ.

**دەم پێکاهاتن:** زار لێک نران، زمان بەستران و زارنەکرانەوە لەترسان یا لە برسان.

**دەم پیس:** جنێوفرۆش، زمان پیس.

**دەم تاڵ:** قسەڕەق، زمان شڕ، بەدزووان. ـــ ی: قسەڕەقی.

**دەم تەڕ:** بە کسێک دەڵێن کە هەر بەزار پیاوەتی بکات و کردەوەی نەبێ.

**دەم تەراق** (هەورا.): دەم بەتریقە، زار بەتریقە.

**دەم تەرکەرە:** مەبەس لە میوە و تەرەکاری و چتی وایە کەدەم تەڕ بکاتەوە.

**دەم تەقاندن:** زارلێکدان، ئاخوتنی پڕ و پووچ، چەنەلێدان، چەنەبازی.

**دەم تەقانن** (ئەردە.): زمان بە مەلاَشووەوە نووساندن تا دەنگ لە زارەوەبێ.

**دەمتەقێن:** چەنەباز.

**دەم تێژەندن:** دەم تێوەدان، منداڵەکە یا پشیلەکە دەمی نایە ناو چێشتەکە. لەناو بردن، بڕزۆ دەمی ژەندەسامانی باوکی و هیچی نەهێشتەوە.

**دەم تێکەڵبوون:** زار بە یەکداهاتن.

**دەم تێنان** (ئەردە.): دەم تێنان بۆ خواردن و خواردنەوە بەکار دەبرێ پتر بۆ شیری مەمک، مژین.

**دەم تێوەدان:** زاربردن بۆ قسە و لەبابەتێکەوە دووان.

**دەم تێوەدەر:** خۆتێ هەڵقوتێن.

**دەمجاو:** زارجوو، ئەوەندە بنێشتەیە کە بە زار بجوورێ.

**دەمچاو:** دەم و چاو.

**دەمچەپەڵ:** زارپیس، بەدزووان، دەم تاڵ.

**دەمچەرفدان:** چەنە لێ دان، چەناگەدان.

**دەمچەفت:** دەمچەوت، بێکارە، دەست وپێ سپی، بێ دەم وپل.

**دەمچەفتن:** دەمچەوتی، بێ کارەیی.

**دەمچەوت:** دەمچەفت، بێکارە، دەست وپێ سپی، بێ دەم وپل. ـــ ی: دەمچەفتی، بێکارەیی، دەست وپێ سپێتی.

**دەمچوونەکلیلە:** زار بەستران لەترسان و بەهەر هۆیەکی بێ.

**دەمخاو:** کەسێکە قسە بەخاوی بکات، شلْەژاوە.

**دەمخۆش:** زارخۆش، ئافەرین.

**دەمخۆشانە:** زارخۆشانە، مزگێنی، خەلاَت.

**دەمخۆشی:** زارخۆشی.

**دەمداچەقاندن:** چاوبرسێتی، ئازوەری، قرم، زارداپچڕین.

**دەمداچەقانن:** دەم داچەقاندن.

**دەمدار:** کەسێکە بەدەم وپل بێ بۆ ئاخۆتن و گفت و گۆ.

**دەمدان:** دەرکەوتنی خونچە و سەری سەوزایی، لەوەڕینی ئاژاڵانە ماوەیەکی کەم. ـــ ی کوورە: باتێکردن. درێژکردنەوە، بەدەمەوەدان، لەدرودان. گەیشتنی میوە.

**دەمدانەوە:** گەشانەوەی گوڵ یا قەڵشینی میوە و هەنارە ،کرانەوەی زاری برین.

**دەمدانەیەک:** پێکداداان، پێکەوەنان، لێکنان (بۆ پەرتووک و ئیتر).

**دەمدەر** (فە.): بەردەرگانە.

**دەمدەم:** جارجارە، دەمدەمە.

**دەمدەما** (ئەردە.): دەمایدەم، دەم، سەرەتا، هەوەڵ.

**دەمدەمان:** دەم بەدەمەوەنان.

**دەمدەمە:** دەمدەم، جارجارە.

**دەمدەمەکی:** دەمدەمی.

**دەمدەمی:** دەمدەمەکی، دەقدەقی، پەتیارە، سەرسەری، هیچ و پووچ، وازوازی، جینگەنە، جینگز، جەنگەنە، وازی وازی، تاوتاوی. مرۆی ڕاڕا. جارجارە، جاروبارە.

**دەمدڕاو:** ڕاز ڕانەگر، زۆر بڵێ، ئاشکراکار، کەسێکە قسە لەمزاریدا ڕانەوەستێ. ـــ ی: پڕپرسی، ڕازڕانەگرتن.

**دەمدروون:** بێ دەنگ بوون و هەست لە خۆبڕین. بۆ دەمکوتکردنی خەڵکیش بەکاردەبرێ.

**دەمدرێژ:** چەنەباز، بێ شەرم، درێژدادڕ. ـــ ی: چەنەبازی، بێ شەرمی، درێژدادڕی.

**دەمدوور:** زاربین، زارەوانە.

**دەمڕاس:** دەمڕاست.

**دەمڕاست** (باک.): شۆفار. دەمڕاس، مرۆی لێزان و قسەڕەوا، ڕاستگۆ، دروست وێژ.

**دەمڕاست بوونەوە:** مەبەس لە تێر خواردنی برسی و هەژارێکییە، دەوڵەمەند بوون. قسە وەسەرکەوتن.

**دەمڕاستی:** تێرخواردنی هەژار و برسێکییە، قسەڕۆیی، قسەڕەوایی.

**دەمڕەش:** برێتییە لە یەکێک، کە هەر نەخشەی خراپ لێ بدات و شووم بێ. ـــ ی: شوومی و نەخشەی خراپ لێدان.

**دەمڕووت:** بە یەکێکی منداڵکاری بێ نموود دەکوترێ کە شەرمی لێ نەکرێ.

**دەمڕێ** (باک.): چین.

**دەمژمار** (هەورا.): کاتژمێر، کەژمێر.

**دەمژمارساز** (هەورا.): کەژمێرساز. ـــ ی (هەورا.): کەژمێرسازی.

**دەمژمارێو** (هەورا.): کەژمێرێک.

**دەمژمێر:** (هەورا.) دەمژمار، کاتژمێر. ـــ ی: کات ژماردن.

**دەمسارد:** بێ دەم وپل، ناهومێد. ـــ ی: بێ دەم وپلی، ناهومێدی.

**دەمسەرد:** دەمسارد، ناهومێد، دڵسارد.

**دەمسەردەوەبوون:** ناهومێدبوون.

**دەمسەردی:** ناهومێدی.

**دەمسپی:** وەکوو ڕیش سپی وایە، مرۆی قسە ڕەوایە کە ڕێزی بگیرێ و شەرمی لێ بکرێ.

**دەمسووان** (ئەردە.): ئاردەسووان، برشتی ئاسنی، وورد ئاسنێکە دوای برەندکاری و سوونەوە لێی هەڵبوەرێ.

**دەمسوور:** کەسێکە لەکارێکیدا پشت ئەستووربێ، ئازا، بەجەرگ.

**دەمسوورە** (کۆ.): (کۆ.) لچە، جوورە ماسییەکە.

**دەمشڕ:** دەمدڕاو، ڕاز ڕانەگر.

**دەمشل:** دەمسارد، دڵسارد، ناهومێد.

**دەمقاڵی:** دەمەقاڵی.

**دەمقڕە:** دەمقاڵی.*

**دەمقووچاندن:** دەم قووچانن.

**دەمقووچانن:** دەم قووچاندن.

**دەمقووچیاگ:** دەمقووچاو.

**دەمکار:** چینی دیوارە بە ڕووکاری دیوی دەرەوەیدا.

**دەمکانە:** (خۆ.، ڕەوا.، سوور.) دووکانە، دەمووکانە.

**دەمکراو:** چای لێنراو و ئامادەکراو.

**دەمکردن:** چالێنان و ئامادەکردنی، لێنان، وەسەرنان.

**دەمکۆ** (ئەردە.): سەر زەنش.

**دەمکوت:** مات، کپ، سست، بێ دەنگ. ـــ کردن: کپکردن، کرکردن، قرتە لێ برین، بێ دەنگ کردنی کەسێک لەبەر چتێک لەدروان.

**دەمکوتکردن:** لەدروان خستن، خامۆش و بێدەنگ کردنی کەسێکی سا بە هەر هۆیەکییەوەبێ.

**دەمکوش:** دەمگوش، زاربین، بزمۆک.

**دەمکێشان:** لووشەکردن، پشوودان. پێگەیشتنی چاو و پڵاو و ئیتر، دەم بوون.

**دەمگا:** جێگای دەماندنی کوورە. جێگای دەم و ماچ و مووچ.

**دەمگەرم:** مەردومی قسەڕەوایە.

**دەمگەنیگ:** زاربۆگەن.

**دەمگر** (باک.): گووپن.

**دەمگرتن:** زاربەستن، مەبەس لە ڕووشکان و کەم قسەکردنی بێ شەرمانە.

**دەمگرتنەوە:** زاربەستنەوە، مەبەس لە خۆگیرانەوەیە لە خواردن واتە بە دەستندە چتی بخوات.

**دەملار:** زارخووار.

**دەملارە:** ئەو جوورە تونگانە (سوراحی) کە تۆزێک دەمی لارە.

**دەم لێدان:** لێدوان، خۆ بە لێزان و قسەزان و ئیتر نیشاندان، چەنەلێدان، ووتن. سازندەیی. دەمدان، دەمین (بۆ کوورەی زێڕینگەری و ئیتر).

**دەم لێکنان:** زار قووچاندن، بۆ مردن و هەناسە برانیش بەکاردێت.

**دەم لێ نیان:** دەم پێوەنان، زار بە گۆزە و ئیترەوەنان.

**دەم مقەست** (هەو.): زیندەوارێکە وەهەزار پێیی دەچێ بەڵان چکۆڵەترە.

**دەمنە** (هەورا.): مۆدنە، دارجغارە.

**دەمنەجگەرە** (هەورا.): مۆدنە، دارجغارە.

**دەم نەوێساگ** (ئەردە.): زاردڕاو، دەمشڕ.

**دەمنەی ئاسیاو** (جا.، ڕەوا.) پۆزگە، دۆزەقە.

**دەمنێ:** تەختەیەکە دەدرێ لەسەر لای خووارووی نیێ و کونێکی تێدەکرێ و شاگونجی تێ هەڵدەکێشرێ.

**دەمنی** (دزە.): دەڵێی، دەق، هەر وەکوو.

**دەم نیانە ئاو:** زار لە ئاونان.

**دەموپل:** دەم وچاو، لێشیاوی، زرنگی. بە ـــ: دەمەوەر. بە ـــ ی: دەمەوەری. بێ ـــ: دەڤمری، دەمچەوت.

**دەموپل پاراو:** زمانلووس، دەمەوەر، شەهتۆت، زماندار، ڕەوانبێژ، قسەڕەوا.

**دەموجەم** (خۆ.): ئابۆر.

**دەموچاو:** دەک ودیم، دیدار، شێوە، ڕوو و ڕوومەت، ڕوو، ڕوخسار، چارە، ڕووالەت، چڕوچاو.

**دەموچاوهەڵگر:** ئافرەتێکە، کە موو لەدەم و چاوی ژنان بکاتەوە و جووانی بکات.

**دەموچاوهەڵگرتن:** موو لە ڕووکردنەوە و ڕووجووانکردن.

**دەمودەس:** دەم ودەست.

**دەمودەست:** فرزە، زوو، ئازا، دەست بەجێ، بەتاڵووکە، (باک.) تاڤل، کوتوپڕ، لەهێکڕا. ـــ ی: کوت وپڕی، دەست بەجێ یی.

**دەمودوو:** مەبەس لە ورتن وگفت وگۆیە، دەڵێن دارا ـــ ی خۆشە، زمانی شیرینە.

**دەمودووان:** دەم ودوو.

**دەم وورە** (ئەردە.): سروە، سرتە، ئاخۆتنی لەسەرەخۆ. (ئەردە.) قیڕەقیڕ، قڕڕە، شەڕ و کێشە بەئاخۆتن.

**دەموورە:** تەموورە.

**دەمووش** (باک.): شیلەی چتی شیرین و ئیتر. مشت وماڵکراو.

**دەمووشت** (باک.): لیچق، چەسپدار، گر، دەستی من بە ـ بوویە: دەستم چەسپدار بووە.

**دەموفلچ:** دەم وفلق، دەم وقەوچە، پتوپۆز.

**دەموفلق:** دەم ودووی ناشیرین.

**دەموقەوچە** (ئەردە.): دەم وفلق، دەم ولەوس.

**دەمووکانە:** دەمکانە، موخوڕ، جوورێکە لەبەری دارەمازوو وەکوو دەنکی ئاڵووباڵووی وایە دەکوترێ و ئاوە لینجەکەی خۆش دەکرێ لەسەر قونێر و هەندێ برینان دادەنرێ و بۆ زۆر چتی تریش بەکار دەبرێ.

**دەمووکاوێژ:** دەم وفلق.

**دەمووکە:** دەمورکانە، دەمکانە.

**دەمهاتن بەیەکار:** دەم هاتن بە یەکدا.

**دەمهاتن بەیەکدا:** زار وێک هاتن وقووچان.

**دەمهار:** دەمهەراش. ـــ ی: دەمهەراشی.

**دەم هەراش:** بەدەم، دەمەوەر، سازندە، زماندار، زماندرێژ. ـــ ی: زارگەرمی، سازندەیی.

**دەمهەژدیها:** زارهەژدیها، جوورەگوڵێکی هەمەڕەنگەو بێ بۆنەو وە زاری هەژدیهای دەچێ کە گەورەبێ وگەرووی بکوشرێ زاری لێکدەکاتەوە.

**دەمهەڤری** (باک.): کێش.

**دەمهەڵە:** زارشڕ، دەم نەوێساگ.

**دەمهەڵبەس:** دەمهەڵبەست.

**دەمهەڵبەست:** ورتەیەکە لە خۆڕا هەڵبەسترابێ.

**دەمهەڵپچڕان:** مەبەس لەئاخۆتنە. ـ دن: وەئاخۆتن ودووان خستن.

**دەمهەڵهێنانەوە:** مەبەس لە خۆئامادەکردنی مرۆڤە بۆ ئاخۆتن.

**دەم یەکدان:** زارلێکنان، پەرتووک لێکنان.

**دەمی:** کاتی، هنگا، هشکەلی، دەمینی. لە ـ: لەکاتی، ژێلی.

**دەم یەکنان:** خامۆش، بێدەنگی.

**دەم یەکنیان:** زار لێکنان، خامۆش.

**دەمێکە:** ژمێژە، ژمێژڤە، لەمێژە. ـــ کورد لەخشتە براوەوخاکەکەشی دابەشکراوە.

**دەمێکی:** تاوێکی، بیستێکی.

**دەمێو** (هەورا.): ماوەیەک.

**دەمین** (هەورا.): دەفین، با تێکردن، دەماندنی کوورە. هەڵاتنی تاو، دەرکەوتنی گیاو سەوزەوات. ـ ی (باک.): کاتی، دەمی.

**دەن** (شار.): گرد، تەپە. (باک.) دەنگ، دەی. (هەورا.) پەراسوو. (باد.، باک.) کووپەی گەورە. ڕەنگ.

**دەنا:** ئەگەرنا، وەگەرنە، ئەگەرنە. (دەر.) نخۆ، نەخۆ.ئان، ئانی، ئانگۆ، ئەگینا.

**دەنانا:** ئەدی نا، ئەیینا ؟ نا ؟.

**دەنان** (شوورا.): ددان.

**دەنە** (کە.): پەراسوو. (دەننە) (ئەردە.): پەراسوو.

**دەنەشەن** (کە.): ددانەکانی شەنەی دەغلان.

**دەند:** زمانەی ئێرەقە. (باک.) تۆوی شووتی وکاڵەک وهەموو چتێکی.

**دەندە** (هەورا.، فە.): پارچەئێسکێکی پەراسووی گیان لەبەرانە. پەراسوو. (موک.) ئەو زمانەیە لە کەرستەی جووتیدا کە گاسنی تێدەخرێت. هێشە، یەرەق، ئاموور. هەنجار، سەرنیش، هەوجاڕ.

**دەندەرۆچک** (خۆ.): دەندەرۆشک.

**دەندەرۆشک:** تۆوی کەنگرییە کەوشکبێ ئێگجار ڕەق دەبێ، وە هەر چتێکی ووشکو ڕەق بێ وەوی دەچووێنن.

**دەندک** (باک.): دەند. تۆوی شووتی وکاڵەک وهەموجوورە چتێکییە.

**دەندوو**(کۆ.): دەندە.

**دەندووش** (باک.): ئەو گوڵ وخلخلانەیە کە ژنان ومنداڵان بەخۆیانییەوە دەکەن.

**دەندووک:** دندووک، زاری باڵندان.

**دەندووکچە** (باد.): جوورەهەنارێکە.

**دەندی** (باک.): زەرگەتە.

**دەنک** (ئەردە.): پەراسوو. دانە، دەن، دان، دەنکک، رژک، قل، تەلّ، (هەو.) قلی، دەنکە. بۆ دانەوێڵەو هەموو چتێکی دەبێ وەدەنکە هەنار وئیتر. ناوک، دەنکە چەقالە. یەک، تاک. (شار.) کەمێک، تۆزێک، نەختێک.

**دەنکە:** دەنک بەهەموو واتاکانیەوە. (ئەردە.) چەودان.

**دەنکە نار** (هەورا.): (خۆ. ،دەر.) برمانە.

**دەنک دەنک:** دانەدانە.

**دەنکک** (باک.): دەنک، چەقالە.

**دەنگ:** شەت، بریو، قریشتە، هەرا، زیقە، هەللا، ئاوازە، تەقە، خەبەر، فززە، کرک، کەلپ، شەماتە، زەلە، پێژن، دەن، دەنید، زاڵە، زایەڵە، بانک، ئاواز. بێ ـــ: بێ هەست وخوست. بێ ـــ ی: بێ هەست و خوستی. ـــ بڵند کردن: دەنگ دەربرین. بۆ گریان: لە گابۆڕدان. بۆگۆرانی: تێهەڵکردن. ـــ کرن: بانگ کردن، هاوارکردن، وەڵامدانەوە. ـــ دان: شەپۆلدانی دەنگ، وەڵامدانەوە. وەڵام: دەنگ و باس، (باک.) دەن، خەبەر، باس وخوواس، ئاگا. ئەڤ دورمەهـ کوتوو دەنگ ژتە نەهات: ئەو دوورمانگە کە هیچ وەڵامێک لەتۆوە نەهاتووە. ئاشتی، ئاشنایەتی، دۆستایەتی. دەنگیان لەیەکتری گۆڕیوە: واتە بەندیواری دۆستایەتیان پساندووە. (باک.) دنگی ساوار کوتانێیە. بێ ـــ بوون: حەجمین، تەبتین، هاوێس، خامۆش، ئارام، کپ، (باک.) پەپس، دیبخ، ووس، ووست، بێ هەست، کژومات، کش ومات. بێ ـــ ی: کپی، خامۆشی، تەپسی، ئارامی، ماتەمات، کەڕاهی،کری. بێ ـــ بوون: دامرکان، دامران، ئارام بوون. وە ـــ هاتن: قیراندن، ویقاندن، قیژاندن، گوڕاندن. دەنگی ئاوێ: هاشە، ـــ ی دێ. دەنگی ئەسپی: حیلەحیل، دەحیلێنێ. دەنگی بارانەی: خرمە، خرمەی دێ. دەنگی بای: هاشە، ـــ ی دێ. دەنگی پشیلەی: میاوە، دەمیاوێنێ. دەنگی تفەنگێ: تەقە، تەقەی دێ. دەنگی تۆپی: گرمە، ناڵە، دەگرمێنێ، دەباڵێنێ. دەنگی خۆش: ئاوازە. دەنگی خۆشبەز (ئوتۆمۆبیل): گڕە، گڕەی دێ. دەنگی چۆلەکەی: جیکە، جیکەجیک: جیکەی دێ، سریوە: دەسریوێنێ. دەنگی ڕێوی: واقە، واقەواق، واقەواقێنێ. ـــ ی زەرگەتەی: گیزە، گیزەگیز، ووزەووز ـــ ی دێ. ـــ ی ژەنگەسوورەی: ووزە، ووزەووز ـــ ی دێ. ـــ ی سەگی: حەپە، حەپەحەپ، عەوعەو، وەڕین، حەپەی دێ، دەوەڕێ. ـــ ی سیوسیوەی دەرکێ: سیرە، ـــ ی دێ. ـــ ی شکانی دار: قرچە، قرچەی دێ. دەنگی کەوتنی چتێکی قورس: تەپە، زرمە، ـــ ی دێ. ـــ ی کەوێ: قەبقەب، ـــ ی دەکا. ـــ ی ماری: جیرەجیر، جیرەی دێ. ـــ ی مەڕی: باڵە، باڵەباڵ، دەباڵێنێ. ـــ ی گامێشی: هۆقە، هۆقەهۆق، ـــ ی دێ. ـــ ی گای: بۆڕە، بۆڕەبۆڕ، ـــ ی دێ. ـــ ی مێشوولەی: ووزە، گیزە ـــ ی دێ. ـــ ی نەخۆشی: نقە، نکە، نکەنک، ـــ ی دێ. دەنگی هەوری: گرمە، گرمەگرم، بۆڵە، بۆڵەبۆڵ، ـــ ی دێ.

**دەنگاڤێژ:** دەنگاوێژ.

**دەنگاڵ:** (بل.): ئاوێکە لە قەڵشتی کێوان یا لەدرزی زەویان ڕەوان بێت و کانیش نیە.

**دەنگانە** (باک.): نێودار، بەناوبانگ.

**دەنگە:** قاو، چرە.

**دەنگەدەنگ:** واتەوات، ژاوەژاو، گازەگاز، قریشت و هۆڕ، قریشتە، هەراهەرا، هەللاهەللا، جروو کۆمی، چراوەچراو، قاوەقاو، دەنگ و دۆز، رمرم، رمێن، دەنگی یەک لەدووای یەکتری.

**دەنگەشە** (ئەردە.): دەنگەدەنگ و هەراهەرا، دەمقرە، قرە، قرەقر، قاوەقاو.

**دەنگەوەرە:** بۆ کەسێک بەکاردەبرێ کە دەنگی یەکێک بە یەکێکی یا بە چەند کەسێکی دوور ڕابگەیەنێ.

**دەنگ بەدەنگ یەکدان:** جووتی، دەنگ لێکدان.

**دەنگ بەرز:** گیانداری دەنگ زل. ـــ ی: دەنگ زلی.

**دەنگ بێژ** (باک.): گۆرانی بێژ. ـــ ی (باک.): گۆرانی بێژی.

**دەنگ پێچیاگ** (ئەردە.): دەنگدانەوەی کێو و ئەشکەوت و گەرماو و ئیتر.

**دەنگ تەپل** (ئەردە.): دمبلی دمباو.

**دەنگخۆش:** خۆشئاواز، خۆشبێژ، ئاوازەخوان، خۆشکۆ، گۆرانی بێژ، کەسێکە ئاوازەی خۆشبێ. ـــ ی: ئاوازە خوانی، خۆشبێژی، گۆرانی بێژی، خۆشگۆیی، خۆش دەنگ.

**دەنگ دابڕین:** قسە بڕینەوە لەگەڵ یەکێکیدا.

**دەنگدار:** بەناو بانگ، دەنگدێر، بەنێوبانگ. چتێکە دەنگی لێوەبێ. ـــ ی: بەنێوبانگی، (باک.) شەپۆلی دەنگان، دەنگدایی، دەنگداری.

**دەنگدان:** تێڕاخوڕین، تێخوڕین، دوواندن، فەرماندان. بانگ کردن وەکوو: کابرا، هۆی هەرامە. دەرکردن، قاودان، بانگهێشتن کردن.

**دەنگدانەوە:** دەردەنگ، ڕازە، دەنگڤەدان، شەپۆلدانەوەی دەنگ، زرینگانەوەی دەنگ، بلاوبوونەوەی دەنگ و باسە بە جۆرێک کە گەلێ کەس گوێی لێ بێ. گەڕانەوەی دەنگ لەناو چیاو ئەشکەوت و گەرماو و گومبەزاندا.

**دەنگدایرە:** دەنگی دەفە و ساز و سەمتوور.

**دەنگدەرچوون:** بلاوبوونەوەی دەنگ و باسێکە لەلایەن یەکێک یا دەستەیەکەوە بۆ ناو خەلک.

**دەنگدەرهاتن:** دەنگ دەرچوون بە جوورێکی وا کە ئەم و ئەو بی بیەن.

**دەنگ دڕان:** مەبەس لە توندی و زۆر هاوارکردنە.

**دەنگزەنگ:** دەنگی زەنگی.

**دەنگڤەدان** (باک.): دەنگدانەوە.

**دەنگ کەوتن:** دەنگ نووسان.

**دەنگ کردن:** بانگ کردن، هاوارکردن، قسەکردن، لێ دووان. دەنگ کرن، هەڵدانە قسە یا وەڵام دانەوە. تێخوڕین، دەنگدان، لێخوڕین.

**دەنگ گڕ:** دەنگ زل.

**دەنگ گۆڕین:** یەکتر نەدوواندن، (کۆ.) خێوترشی (خێ وترشی).

**دەنگ گیریان:** دەنگ زل بوون، دەنگ گڕبوون.

**دەنگ لێکردن:** بانگ کردن، یا دەر کردنی چتێک.

**دەنگمەڵ** (دەنگ مەل): دەنگی پەڕەووری.

**دەنگ نەقارە:** دمبلی دمباو.

**دەنگ نووسان:** کپ بوونی دەنگ وەدەرنەهاتن، (هەورا.) دەنگ نووسیای. دەنگ کەوتن.

**دەنگ نووساو:** دەنگ کەرخ، دەنگ نووسیاگ. ـــ ی(هەورا.): دەنگ نووسان.

**دەنگ نێر:** دەنگ زل، کەسێکە دەنگی گڕ وقەبەبێ.

**دەنگ و باس:** دەنگ، تەرزەنوو، خەوەر، هاڵ و هەواڵ، باس، خوواس، ئاگایی، کوتەدووان و ئاخەفتنێکە، کە بکەوێتە سەر زار و زمانان و بڵاوبێتەوە.

**دەنگ و دۆر:** دەنگەدەنگ و هەراوهۆریا.

**دەنگین:** ناسراو.

**دەنووک** (کە.): دندووک.

**دەنووکە** (ئەردە.): دەموکانە.

**دەنووکە لەقلەق** (کە.): گیایەکی وورده دندوکی وەنی لەگلەگی دەچێت.

**دەنووک کەوچکە:** جوورێکە لەمەراری.

**دەنید:** دەنگ.

**دەنێو:** لەنێو، نێو، توونێ، (ڕەوا.) دوو. تۆولۆ. ـــ لێفەی دا: تۆولۆ لێفەدا. ـــ ی قاقەزی دا: تۆولۆ قاقەزدا.

**دەو:** دەم، زار، دم. پەلە، تاڵووکە. دمە گوێزان. (شکا.، باک.، باد.) دۆ، (باک.) زیاندەر، گومڕاکەر. پشک ئاوێژتن جووره ژمارەیەکە، کە لەناو چەند کەسێکی دادەکرێ، دووانیان یەکی چەند قامکێک دەهێننە پێشەوە یەکێکیان دەڵێ (دەو) لە تۆ، ئەو سا قامکەکان لێکدەدەنەوە و دە ژمارەی دیکەشی دەخەنە سەر گردیەکەی هەر چەند بوو لەو کەسەوە کە دەوی لێ کراوە ئەژمێرێ لەسەر هەر کامێکیان تەواو بوو ئەو دەیباتەوە.

**دەوا** (ڕەوا.): دەرمان.

**دەوات:** مەرەکەبدان، دەوێت، (کە.) دووات.

**دەواخ:** دەباخ، خۆشکردنی چەرم.

**دەواخانە:** دەرمانخانە، دەباخ خانە.

**دەواخچی:** دەباخچی.

**دەوار:** پەلاسێکی پانی درێژی تەختەتەختەیە لە موو دەچنرێ کۆچەران وەکوو چادر هەڵی دەدەن و دەچنە ناوی، ڕەشماڵ. (باد.) وولاخی بەرزە، ئەسپ، ماین، ئێستر، کەر. (باک.) ڕەشە وولاخ. ـــ ی ستوور: کەر، ماین، ئەسپ، ئێستر. (هەر.) وولاخی بەرزە، چارەوا، ئەسپ، ماین، ئێستر، بارەبەر، پێرۆ. ـــ ی (کە.): جووره قابێکی قووڵە.

**دەوان:** دەبان، تیغی دەبان وەکوو خەنجەر و شیرکەدەمەکەی جەوهەرداره.

**دەوانچە** (هەمە.): دەمانچە.

**دەوافرۆش** (هەورا.): دەرمانفرۆش.

**دەوە:** دەبە. ساهیک، تەپاڵەییکە لە ڕیخی ڕەشەوولاخ و ئێستر ژنان بەدەست دروستی دەکەن و لە تەپاڵە بەرینتر و درێژتره. ـــ کردن: پێژتن.

**دەوەدەشتی:** شیاکەییکە لە دەرەوەی ئاواییدا هەر لە خۆڕا ووشک بووبێتەوە، دەوەکێویلە، (هەورا.) سەرگین، تەپاڵە.

**دەوەره** (ئەردە.): چارە، چارەسازی، دەرمانکردن، تیمار. ـــ کردن: چارە و دەرمان کردن.

**دەوە کێوی:** دەوەکێویلە، دەوەدەشتی.

**دەوەری دەرد:** چارەی نەخۆشی، چارە.

**دەوەکێویلە:** دەوەکێوی، سەرگین، دەوەدەشتی، تەپاڵە، (دەر.) لاس، (زەن.) سەهەن، شیاکەی ووشک بووەوە.

**دەوەڵان:** ڕیزە تەپاڵەییکە بە گردی بڵنددەکرێ و ناوەکەشی پڕدەکرێ لە پەین و وورده تەپاڵە و پشکەڵ.

**دەوەن:** ئەو پنجە دارانەیە کە کورتن هەر لە ناوییەوە چەند لکێکیان لێ جووێ دەبێتەوە و زۆر بڵند نابن. بە بنکەداره بەڕوو و مازووش دەڵێن کە تازە هەڵیدا بێتەوە دووای بڕانی. تەرە، خووەڕێل، (باک.) شتل، (هەو.، بار.، دەر.) تەراش، پنچک، کوورس، میتک، بتە، بەو دارانە دەڵێن کە زۆر بەرز نەبووبن. جەنگەڵ، مێشە، لێر، لێرەوار. قامیشەڵان.

**دەوەن بەنئاش:** مەبەس لەدووان و ئاخەفتنێکی زۆری بێ سوودە.

**دەوەند:** دەوەن.

**دەوجا** (کۆ.): دەسا، دەجا.

**دەوخ** (باک.): ماندوویێتی.

**دەوخین** (باک.): ماندووبوون.

**دەور:** پەڕ، پەراپەڕ، قەراخ، قەووڕخە، دەوره. ـــ کردنەوە: پێدا چوونەوەی دەور و وانە و ئیتر.

**دەوران** (هەو.): لە گەمەی خەنخەنانێدا کە سێ جاران هەرسێک خەنەکان گەڕاو نەیدۆڕاند ـــ ی پێدەڵێن. دەوره.

**دەوراندەور:** پەراپەڕ، گرداگرد.

**دەوره:** گڕ، دەور، قەووڕخە، پەراپەر. ـــ دان: دانەبنار، داگرتن، گرگرتن، ئاخڵەدان، تەوەنەدان، دەورگرتن، تەنوورەدان. چاخ، چەرخ، ڕۆژگار، دەران.

**دەورەدان:** ئاخڵەدانی چتێک، گەمارۆدان، دەوردان.

**دەورەکردن:** خولخواردن، چەرخ خواردن.

**دەورەگرتن:** دەورگرتن، ئاخڵەدان، پارچە بەلێواری پێڵاواندا گرتن.

**دەووردەم** (ئەردە.): لموز، خرتووم، پووز، پووزه.

**دەوورکەردەیۆ** (هەورا.): دەوورکردنەوە.

**دەوروبەر:** دەوروپشت.

**دەوروپشت:** هەر چوارلا، دەوروبەر، سوور وپەست، هاویردۆر، (خۆ.) پێ پانە. ناوچەو دەوروبەر.

**دەوری:** (باک.) تەبەق، ئامانێکی پەلی نێوداره. ـــ ی چینی: فەخفووری.

**دەورێش:** عەوداڵ، بێ ماڵ وحاڵ، مریدی تەریقەتی قادری بە پرچ. *

**دەووس:** شوێن، شوێنەوار.

**دەوساندن** (باک.): چەرخی کوشین، ماکینەیەکە ترێی دەکوشێ، بەلاقی هەڵشێلان، پاماڵ کردن، پێ پەستکردن.

**دەوسین:** شێلران، پاماڵکران، ڕەنج دران.

**دەووش:** شوێن پێ.

**دەووشک** (باک.): دۆد انە.

**دەوقاندن**: تاقی کردنەوە.

**دەوکل**: کابانێکە ڕۆنی کەرە بەرهەم بێنێ.

**دەوکول**: زارێشە.

**دەوکیس** (زا.): خستەی توورەکە.

**دەول** (باک.): ڕەچەڵەک، (باک.) سەتڵ و دۆڵکە و لۆنکەی چەرمین کناوی لە چاڵاواندا پێ دەکێشن. (کە.، هەورا.) دەهۆڵ، تەپل. (دەر.) لەگەڵ.

**دەووڵ**: هەوڵ و تەقەلا.

**دەوول** (باک.): سەتڵی چەرمین. ماڵ و سامان و دەوڵەتە. دەوڵەمەند واتا خاوەندی سامان و ماڵ و دەوڵەت، دەستەلات.

**دەوڵەت**: سامان، ماڵ و داهات، خۆشبەختی، پەروپۆ، پەڵوپۆ، ماڵ، ئاژاڵ، ڕەشە ووڵاخ و ووڵاخی بەرزە. فەرمانداری، بەندەری، نێرێتی، میری.

**دەوڵەتکەتی** (باک.): هەژار، لێکەوتوو.

**دەوڵەتگێڕ**: فەرمانڕەوا، فەرمان بین، فەرماندار. ــ ی: فەرمانڕەوایی، فەرمانداری.

**دەوڵەتمەند**: دەوڵەمەند.

**دەوڵەتی** (باک.): پیرۆز. میری، میرێتی، چتێکە هی میری بێ.

**دەوڵەقووچ** (دزە.): زاربەستوو، دەم قووچاو، مات، کپ. هەژار، ڕووت. ــ ی (دزە.): زاربەستوویی، ماتی، کپی. هەژاری، ڕووتی، ڕەجاڵی.

**دەوڵەمەن** (هەورا.): دەوڵەمەند.

**دەوڵەمەند**: ماڵدار، دارا، بدار، بەتفاق، بەماڵ، ساماندار، خاوەند سامان، کۆک. ــ بوون: هەڵگران، هەڵانگران. ــ ی: ماڵداری، دەوڵەتمەندی، دارایی، بۆچک، بێ نیازی، هەبوون، هەبین، سامانداری، زەنگینی.

**دەووڵتە** (باد.): خڵتەی ڕۆنییە کە لە کەنار و بنی مەنجەڵ و هیزە و چتی تردا دەنیشێ دووای تووانەوەی.

**دەوون** (ئەردە.): دەوەند. دەوەن.

**دەولک** (هەو.، باک.): جەرت، سەتڵی جیلی یا چەرمین.

**دەولۆ** (هەو.): ئەو گوڵەیە دەمی بۆ پشکووتن لێک کردبێتەوە، دەولوو، دەولوو. بادامێکە خەریکی گەیشتن بێ یا پەلکەشینەکەی بقەڵشێ.

**دەولوو**: (هەو.) دەولۆ.

دەولووکانە(هەورا.): دەمکانە.

**دەوڵیان** (ئەردە.): دۆڵاو، دۆڵە، ناوگیر.

**دەولیباز** (خۆ.): پزدانی ماڵاتان. (خۆ.) تیکوڵ و توویژ و تفری سەر ڕیخۆڵە و چیکڵدانەیە.

**دەولینگ**: دەلینگ.

**دەوێل** (باک.): سیرمە.

**دەوێت**: (هەورا.) دەوات، دەوێت، مەرەکەبدان.

**دەوێت**: گەواد، تەرەس، قوڕومساخ، دەیووس، جاکیش.

**دەویقاندن** (زا.): تاقی کردنەوەی هێلکەیە لەلایەن ڕەقی و ناسکێتییەوە بە لە ددان دان.

**دەویک** (با.): دۆووک.

**دەوین**: دۆینە.

**دەه** (ڕۆژ.): ووشەیێکە مایینی پێ دەگێڕنەوە، (باک.) بۆ بەرەوی بازاڕی ووڵاخان لەکاتی هاندانیدا بەکاردەبرێت. (باک.) دە (١٠). دێ، گوند.

**دەهان** (باک.): دەیان.

**دەهەزار**: دەجاران هەزار ١٠٠٠٠.

**دەهەک** (باک.): دەیەم، دەهەم.

**دەهەم**: دەهەک.

**دەهەمین**: دەیەمین.

**دەهبە** (باک.): خنەیی، خنەڕەنگ.

**دەهدەلیک** (باک.): چینی.

**دەهرە** (باک.): مرازێکە لق و پۆپی بێ کەلکی دارانی پێ دەبڕن.

**دەهری**: جەرگاووس، (کە.) دەیری. (باک.) جل و پۆشاکی قولاپەچن. زۆر توورە.

**دەهشک** (باک.): جاش.

**دەهف** (باک.): یاڵ.

**دەهفک** (باک.): داو، تەڵە.

**دەهکەر** (باک.): پایە، بناخە. ــ ی: پایەتی، بناخەیی.

**دەهل** (باک.): باخی میوە.

**دەهم** (باک.): کۆچەل. سەرپەرشتی.

**دەهنگابە** (باک.): بەهارەکانی.

**دەهۆ** (مرک.): فێل، کەلەک. جاجمێکە وەکوو شەڵتە هەڵدەدروێ دەغڵی لەسەر خەرمانان پێ دەگوێزرێتەوە یا لەمەڵۆ و شارا پێی دەبەنە سەر خەرمان.

**دەهۆڵ**: دەوڵ، کووس، دهێل، کۆس، دۆڵ. ــ لێدان: دەهۆڵ کوتان.

**دەهۆڵژەن** (کە.): دەهۆڵ لێدەر. ــ ی: دەهۆڵ لێدەر.

**دەهۆڵکوت**: دەهۆڵژەن.

دەهۆڵ

**دەهۆڵ و زوڕنا**: دۆڵ و زوڕنا.

**دەهیە** (باد.): داعبا، درندە.

**دەهیەک** (باک.): دەیەک.

**دەی**: دە، دا، دادەی، ووتەی هاندانە. بەڵێ، بڵێ. بۆ دەنگدانی ووڵاخان بەکار دەبرێ. بۆ هاندانی سەگانیش بەکار دەبرێ، کسکس، حەلە لەلە، دیی. (فە.) دێ، گوند، لادێ. زووکە، زووبە.

**دەیان**: چەندین جارە، دەهان.

**دەیەک**: (باک.) دامان، دەیێک، دەهیەک، لەدەیان یەکێک، لە دەبەشان بەشێک.

**دەیەم**: دەهەم. ــ ین: دەهەمین.

**دەیجا**: دەجا، دەیسا.

**دەیدی:** لە (دەیدک) ی کورتکراوەتەوە، (باک.) لایی لایەیە. کاتێکی ژنان منداڵی خۆیان دەنوێنن دەڵێن: دەیدی لاو دەیدی، دەیدک لانکە هێلینا زارۆکی مرۆڤانە.

**دەیر:** دێر، کلیسا.

**دەیری** (کە.): دەهری، ئەوانەن کە بڕوا و باوەڕیان لەسەر ئەوەیە کە گێتی هەر بووە و هەر دەبێ و پەروەردگاری نیە. دێرنیشین، دێوانە، شێت، هەردە.

**دیزە** (باد.): گەڵای گزرەیە بۆ ئاژاڵان.

**دەیسا:** ئەوسا، دەیجا، دەجا، زووکە، پەلەیکە، دەسادەی.

**دەیسادەی:** بڕوانە: دەیسا.

**دەیسەم** (باک.): پادشایەکی کورد بووە لە کوردستان و ئازەربایجانێدا فەرمانڕەوایی کردووە لە پاشان بەدەستی سالار کوڕی مامەلان گیراوە و چاویان ڕژاندووە و دوایە کوژتوویانە.

**دەیلاخ:** تۆزم، (باک.) گوویبک. گۆلکی ووشتری، بەچکەی ووشتری.

**دەیلەم** (ئەردە.): نێوچاوان، تووێڵ، ناوی تیرەیەکی گەورەیە لە کورد، ابو الفداء الحموی لە باسی کورداندا دەڵێ: فارس سێ ناوی هەیە یا سێ باوکی هەیە و یا سێ نەتەوەن: کورد، جیل، دەیلەم، وادیارە کە جیل ناوی فارسی بە خۆیەوە بەستووە بەڵام کورد بەناوی خۆی مایە تەنها دەیلەم بزر بووە، هێندێک دەڵێن ترکی ئازەربایجانێ لە شوێنێ واندا ماون، (ئەمە درۆیەکی ئاشکرایە چونکوو تورک مغولن و ئاشکراشە کەی هاتوونەتە ئازەربایجان. گیو) هێندێکیش دەڵێن (زازا و دومەل، دومبل) پاشماوەی دەیلەمانن، بەڵام گەلێک ڕاستە و دروستە کە بڵێین دلێم کە ئەمڕۆ بوونە عەرەب و پاشماوەی دەیلەمن لە بنچینەدا کوردن(جگەرخوین).

**دەیم** (کە.): دێم، زەوییێکە تەنها لە بارانە ئاو بخواتەوە و بەس.

**دەیمەڕۆ** (ئەردە.): دێمزار، زەوی دێم.

**دەیمەکار:** دێم، دێمەکار. ـــ ی: دێمەکاری.

**دەیمیلە:** جوورە دەغڵێکە وەکوو هەرزنی وایە، (هەورا.) کەردرە.

**دەینان** (باک.): دانان، دەینە.

**دەیندک** (باک.): چەقالە، بادام.

**دەیووس:** دریت، دەویت، بێ نامووس.

**دەیووڵیین** (دەر.): تێکوشین، تێکوشینکردن، تریت کردن.

**دەیها:** هاها، هەیها، ئاها.

**دب** (دبب) (ئەردە.): وەرە، دەنگێکە باڵندە یا ئاژاڵی پێ بانگ دەکرێ.

**دبارە** (باک.): فێڵ و لیپ و فەرەجی شەڕ و جەنگییە.

**دبدب** (دببدبب) (ئەردە.): ووشەیەکە باڵندە و ئاژاڵی پێ بانگ دەکرێ، وەرەوەرە.

**دبراک** (باک.): باڵندەییکە.

**دبستان:** قوتابخانە. ـــ ی: قوتابی، شاگرد.

**دبووک** (دەر.): دەبێ.

**دبێ دبێ** (ئەردە.): بڕوانە: دبدب.

**دت** (باک.): گەمەیەکی کوردییە.

**دتە** (ڕۆژ.): کچ، کیژ، دۆت.

**دجلە:** زێیەکە لە کوردستانی باکوور هەڵدەقوڵێ و بە ناو شاری موسڵ و بەغدا تێدەپەڕێ تا بەسرە و کەنداو.

**دخسین** (باک.): چاو پێ هەڵنەهاتن، چەپخووس.

**ددان:** (بابا.) دان، (دەر.) دیان، (باک.، ڕەوا.) دران، (فە.) دنان. خلێنە: خرێ، خرێنە، هاروو، کورسی، درانێن کورسی شەش لەسەر ەوە وشەش لە خوارەوەن. کاکیلە: چووار لەسەرێن و چووارێش لەخوارێ. دڕۆک، درانێن ئارگوشکێ، دوودوون. بڕۆک: (کە.) ددانەپێشینیان، ددانێن براکوور. چوار لەسەرێن و چوارلەخوارێ. ددانم ددانم ناگرێ واتە ددانە چیرەمە، هەڵدەلەرزم، هەڵدەچووقێم.

**ددان ئاڵبوونەوە:** سڕ بوونی ددان بە هۆی خواردنی چتی ترشەوە.

**ددان ئێشای** (هەورا.): ددان ئێشە.

**ددان ئێشە:** (هەورا.) ددان ئێشای، ددان ئێشان.

**ددانە:** ددانەی مشار و چەرخ و ئیتر. (بابا.) دیانەدیانە، (هەورا.) بڕکەبڕکە، کونجە، کونجەکونج، هونەرێکە لە پیشەی جۆلایی و مسگەراندا وەکوو ددانی مشاری وایە.

**ددانەپێشینیان** (کە.): ددانەکانی پێشەوە.

**ددانەچیرە:** چۆقەچۆقی ددان لەسەرمان یا لە ترسان، ڕچ، دانەڕچە، دان ڕسکێ. بۆ هەژاری و دەستکورتیش بەکاردەبرێ.

**ددانەڕچە:** ددان لێکدان لەسەرمان یا لە ڕقان یان لە ترسان، چۆقەچۆق.

**ددانەڕێوی:** ددانی ڕێوی، دانڕێوی، جوورە خشڵێکی ناسراوە.

**ددانە زێڕینە:** ئەو ددانە قایمانەیەکە لە دووای تەمەنی حەوتساڵی منداڵان دەردەکەوێ.

**ددانەسەیە:** گیایەکە گەزێک بڵند و بەشلکی گوڵێکی شین دەردەکات و بە چێشتی دەخورێ کە ووشکیش بوو هەموو لەشی دڕووی دەردەکات.

**ددانەگیوینی**(کە.): ددانی حەوتساڵی، ئەو ددانانەیەکە لە تەمەنی حەوتساڵیدا دەردەکەون.

**ددانەمشکە** (موک.): تیک، مام شەبەقە، پشت ماسی، پشت ماسیلکە.

**ددان بە جەرگی خۆدانان:** دڵپەڵگرتن، کوویش، پشوودرێژی، گلەیی نەکردن، ملپانی.

**ددان بەجەرگی خۆدانەر:** پشوو درێژ، گلەیی نەکەر، ملپان، بەپشوو.

**ددان پێدانان:** پێ لێ نان. جوون، جوویین، درکاندن، پالێنان.

**ددان پێدانەر:** درکێنەر، پالێنەر، پێ لێ نەر.

**ددان زێڕ:** ددان زێڕین.

**ددان زێڕین:** ددان زێڕ.

**ددانساز:** ددانکار. ـــ ی: ددانکاری.

**ددانشاش:** ددان بڵاو. ـــ ی: ددان بڵاوی.

**ددانکار:** ددانساز. ـــ ی: ددانسازی.

**ددانکەڵ:** کەسێکە یەک یا چەند ددانێکی کەوتبێ. ـــ ی: ددان کەوتن.

**ددانکەوتن:** ددانکەلی.

**ددانکرمۆڵ:** ددانی کرمێ.

**ددان لەچیرەوەبردن:** گوڤێن، قرساندن.

**ددان گڕ:** دیانگڕ. ــ کردنەوە: قیچکرن.

**ددان مرواری:** ددانی ڕێک و سپی.

**ددان ووشترە** (موک.): جوورە گەڤێکە.

**ددانی حەوتساڵی:** ددانە گیوینی، ددانێکە لە تەمەنی ٧ساڵیدا دەکەوێ.

**ددانی شیری:** ئەو ددانانەیە، کە لە تەمەنی ٦، ٧ ساڵیدا دەکەوێ.

**ددۆ** (باک.): دوو.

**ددوو** (چی.): دوو.

**دڕ:** زبر، زوو، دڕن. زماندرێژ، جنێوفرۆش. ئازا، دڕۆک، دڕندە، بۆ سەگ بەکار دەبرێ، لە شێوەی تەوسوو پللاردا بۆ مرۆڤانیش بەکاردەبرێ.

**دراخە:** مەلۆی دەخڵ.*

**دراڤ** (باک.): پووڵ، پارە، دراو.

**دراڤگەنی** (باک.): بەرچاوتەنگ.

**درامەتی** (باک.): سووێند، سووند.

**دران** (باک.): ددان، درانێن ئارگووشکێ، دڕۆک. درانێن براکوور: چووار ددانە تیژەکان. درانێن کورسی: خلێنە، خرێنە. درانێن بایی: ددانی قولاپی ژەهر داری مارییە. ــ کشاندن: هەڵکرن و یاراکرن.

**دڕان:** دادڕان، داتڵیشان، پارچەپارچەبوون، دەرزین، چڕان، چڕیان.

**دڕاندن:** زڕاندن، هەڵزڕاندن، دادڕاندن، هلهلاندن، چڕاندن، دەرزاندن، ڤەرساندن، زڤارکرن، هلقرتاندن، ڤەرستن.

**دڕاو:** پارچەکراو، تڵیشاو، دادڕاو، دڕیاو، داتڵیشاو، لەت و کوتکراو.

**دراو:** پارە، پووڵ، پەرە، زەڕ، دراڤ. ــ ی نەغد: پووڵی نەغد.

دراو

**دراوسێ:** هاوسایە، هاوسێ، دەراوسێ.

**دراوسێ یەتی:** هاوسێ یەتی.

**دراوکڕ:** بەدراوکڕاو، زێڕکڕ.

**دڕاوی:** باری دڕان.

**دراوی نەغد:** پارەی دروست کراو لە قاقەز یا لە ئاسن.

**درەخت** (کە.، هەورا.): داری بەر دارو و بێ بەرە کە سەوز و بە پێوە بێ، (باک.) بەرانی، شەهینۆک.

**درەخت و تووفی** (هەورا.): دارەتوو.

**درەخت و ناری** (هەورا.): دارەهەنار.

**درەخشان:** تروسکان، تروسکەدار، برووسکانەوە، چتێکە زۆر پرشنگ و ڕووناکی بداتەوە.

**درەخشانەوە:** تررووسکانەوە.

**درەخشانی:** تروسکەداری.

**درەخشینەوە:** تروسکانەوە.

درەخشانەوە

**درەم:** درهەم، بەردێکی ناسراوی تەرازوویە چل و هەشت دەنکە لە زێو.

**درەنگ:** دێر. وە ــ خستن: کشکشاندن، گیرکردن، ڤارقلاندن. وە ــ کەوتن: کشان، کشکشان، گیربوون، ڤارقلین. وەرخەر: درەنگ هێڵ.

**درەنگان:** کاتی درەنگ.

**درەنگتر:** (باک.) پێشتەتر.

**درەنگترین:** دێرترین.

**درەنگ خێز:** سستەپەڵە، خاو.

**درەنگ کردن:** دێرکردن.

**درەنگی:** دێری، کاتی درەنگان.

**درەو** (فە.): درووێنە. ــ کردن: درووێنەکردن. (باد.) درۆ. ــ کەر: درەوین، درۆزن، بێ بەخت.

**درەوان** (ئەردە.): درووێنەکار.

**درەوەنی:** پاڵەیێکە تەنها درووێنە بکات، درووێنەکار.

**درەووش:** ئالا، بەیداخ. ــ ی کاوە: ئالای کاوەی. درێشە.

**درەوشان:** وورشەدان، تروسکان، برووکان، برووکانەوە.

**درەوشانەوە:** تروسکانەوە.

**درەوشاندن:** درەوشانەوە.

**درەوشە** (هەورا.): درێشە.

**درەوشەدار:** تروسکەدار.

**درەوشەوەر:** تروسکەدەر، درەوشەر.

**درەوشەر:** درەوشەدەر، تروسکەدەر، درەوشەر.

**درەوشدار:** ئالادار. ــ ی: ئالاداری.

**درەوشینەوە:** درەوشانەوە.

**درەوکار:** درووێنەکار، درەوکەر. ــ ی: سەپانی.

**درەوکەر** (هەورا.): درووێنەکار، درووێنەکەر. سەپان، وەرزێر، درەوان.

**درەوگەر** (فە.): درووێنەکار. (فە.) ــ ی: درووێنەکاری.

**درەهێ** (باد.): لەوێ، لەوێندەرێ.

**درەهی** (باک.): دارێکە.

**دڕەی** (هەورا.): دڕک، دڕوو، تووتڕک.

**درب** (باک.): درە.

**دڕپێدان:** شەق کردن، کردنەدووپارچە، ڕێگاکردنەوە، دڕدان.

**درد:** دورد.

**دڕدان:** دڕپێدان، جێ کردنەوە، تەکەکردن.

**دڕدڕ** (باک.): دڕک و داڵی گچکەیە.

**دڕدڕک** (باک.): تووتڕک (دارێکە)، (باد.) دڕدڕی.

**دڕدڕی** (باد.): تووتڕک (دارێکە).

**دڕدۆنگ:** پاشڵ پیس. ــ ی: پاشڵ پیسی.

**دردووک:** جەربەزە، ساختەچی، فێڵباز.

**دردووک و پیاڵە:** بێتام وێژ، هەرزەکاری. تازە دەمی دردوک و پیاڵەیەتی.*

**درز:** ترەک، تریز، تریک، تڵیش، دەرز، قەڵەشت، تەرەک، دەرەز، زەنگ، هەرەس بردن، قەڵەشتێکی زۆر زراو و باریکی چت.

**درزبردن:** قەڵشین، شەق بوون، درزدان، ترەکین.

**درزدان:** درزبردن.

**درزگرتن:** ترەک و تڵیش پڕکردنەوە.

**درزی:** دوورزی.

**درزین:** درزبردن.

**درژ** (ڕۆژ.): دڕ، مۆن، تووڕە، تڕۆ، قەڵس، ڕق ئەستوور. (ئەردە.) چتێ خاو کە کرژ ئەبێ.

**درژانگ** (ڕۆژ.): لاوازی، کزی. ـــ دان: لاواز و کزبوون.

**درژاوی:** بەکاوەخۆ.

**درژی** (ڕۆژ.): دڕی، مۆنی، ناوچاوگرژی.

**درسەگ** (کە.): سنوور، تخوویێکە لەنێوانی دووپارچە زەوییاندابێ.

**درست:** دروست. ـــ ی: دروستی.

**درشت:** واژی وورد، گر، گرووز. مرۆی لەندەهۆری گێل. ـــ ی: گری، گرووری (بە پێچەوانەی ووردی). لەندەهۆری، گێلی.

**درقاندن** (ڕۆژ.): قرتەکردنی مریشک.

**درقە** (ڕۆژ.): قرتە.

**درقەدرق** (ڕۆژ.): قرتەقرت کردنی مریشک بە دەوری جووجکەکانیدا.

**درک:** دڕوو، چقڵ، چتێکی باریک و سەرتیژە لە درەخت و گژ و گیایان پەیدا دەبێ لە لەش و کەل و پەل هەڵدەچەقێ.

**درکاندراو:** درکێنراو، پێ لێ نراو، ئاشکراکراو.

**درکاندن:** دەربڕین، پێ لێنان، ترکەزاندن، ترەکاندن، داپلاندن، پالێ نان، ڕازی نهێنی ئاشکراکردن.

**درکانن:** درکاندن.

**درکاوی:** دڕاوی، چقلاوی، چتێکە دڕووی زۆر پێوە بێ، یا شووێنێکە درکی زۆربێ، ماسی درکاوی.

**درکە:** جوورە گرمژەیەکە لە منداڵان دێ و سەریان وەکوو دڕووی تیژە، درکە مێکوتە.

**درکە:** گۆشە، هیما، ڕیک.

**درکەناسینە:** درکە، کە لەوێ.

**درکەتاڵە** (کۆ.): گیایەکە نیو بەژن بڵند دەبێ و ناخورێ و گوڵی زەردی دڕاوی دێنێ.

**درکەزەردە:** زەرسیری، دڕوە زەردە، پنجە گیایەکی زلە کە ووشک بوو دەبێتە دڕوێکی زەرد ووشتر دەیخوا، ووشتر خۆرە، بەووشکی و سووتاوی بە ڕۆنی کەرەوە لە ئاورە و لە هەر برینێکی بدرێ چاکی دەکاتەوە.

**درکەزی** (بابا.): چالووک، جوورە دارێکی دڕاوی هەمیشە سەوز و قایم و بەژنێک بەرزتر دەبێ دەکرێتە پەرژین و لەسەری دیواران دەگیرێ.

**درکەشینە:** گیایەکە دارک و گەڵا و گوڵەکەی شین و دڕاوییە.

**درکەکەلەوێ:** گیایەکی بەهارییە درکێکی تیژ دەردەکا ئەژنۆیەک بەرز دەبێتەوە.

**درکەمێکوتە:** گرمژەی مێکوتە.

**درک گیا:** شخڵی.

**درکوداڵ:** دڕووداڵ.

**درکی مەم وزین:** بەکەسێک دەڵێن، کە گەیشتە چتێک نیتر لێی نەبێتەوە.

**درکێن:** درکێنەر، ددان پێدانەر، پێ لێ نەر.

**درکێنە:** درکێن، جوجکەی تازە تووک لێهاتوو.*

**درکێنەر:** درکێن، پێ لێنەر، ددان پێدانەر.

**درکین:** (ئەردە.) درکاوی، دڕاوی.

**درکینە** (ئەردە.): دڕاوی، درکاوی.

**درگا** (ئەردە.): دەرگا. زار و سەری خیگە و مەشکە و کووپە و ئیتر.

**درگابوون** (ئەردە.): کون بوونی برین و زارکرانەوەی.

**درگاپێوەدان:** دەرکە پێوەدان، جووتکردن.

**درگازەنانە** (ئەردە.): کۆبوونەوە و دروان بەبۆنەی کردنەوەی چتێکەوە.

**درگانە** (ئەردە.): دەرگانە.

**درگاوان:** دەرکەوان.

**درگە** (ئەردە.): دەرە، شیو، کون. ووشکاییێکە، کە هەر چوارلای ئاوبێ.

**درگنە** (باد.): گۆزەی ئاوێ.

**درم** (کە.): ئارسم، پەتا، درمانە، (کە.) درمی. هەڵامەت، پەسیوێکی سارییە، بە هەموو جوورە نەخۆشی و دەردێکی وا دەڵێن کەلێک بگیردرێتەوە. دەنگی تەپڵ.

**درمانە:** درم، پەتا، درمی.

**درم داکەوتن:** بڵاوبوونەوەی هەڵامەتە لە شووێنێکیدا.

**درمی:** درمانە، درم، پەتا.

**درن:** چڵک، بۆدڕن، بۆنی چڵک. (کە.) زوور، زبر، گر، بۆسەگی دڕ و، مرۆی زماندرێژ و بێ شەرمیش بەکار دەبرێ.

**درناسک:** گیایەکە شیرەکەی لەناو ددانی کلۆر و خووار دابنرێ ژانی دەشکێنێ.

**درناڵ:** گرناڵ، درناڵ، سەرچاوگەیەکی ئاوە کە دوو دەریایان پێک بگەیەنێ، زەوی و شووێنێکی بەرد و گرنج گرنج درز و شەقاری زۆر بێ مرۆ نەتووانێ بە ئاسانی پێ یدا بڕوات.

**درنە** (زا.): کرمی ناوزگی مەڕ.

**درنە:** ڕق ئەستوور، قەڵس. (باک.) کونێکی گچکەو ووردە. (فە.) زیوانی برنجی. گەنەی ووڵاخان. درندە.

**درنەگە** (ڕەوا.): گروو. ـــ گرتن: گرووگرتن.

**درنج:** دێو، دێو و درنج، جندۆکە، جنۆکە.

**درندە:** جانەوەری گۆشتخۆر و دڕ وەکوو گورگ و پڵنگ و شێر و وورچ و کەمتیار و بەور و ئیتر، خوێنخۆر.

**درندڕن** (کە.): زبر، زوور.

**درنگانەوە:** زرنگانەوەی گووێ.

**درنگە:** جوورە دەنگێکە وەکوو مس و تەنەکە و کەوان و ئیتر.

**درنگ درنگ:** دەنگی مس ویا تەنەکەی یەک لە دووای یەک.

**درنە:** درندە.

**دروار** (باد.، موک.): بەرگدروو، دروومان.

**درواڕێتی** (باد.، موک.): بەرگدرووێتی.

**درواری** (باد.، موک.): بەرگ دروون.

**دروان:** دووران.

**دروانگه** (گەر.): ڕۆچنە، کولانەی بانی.

**دروو:** دووراو، دوروراو.

**دروی:** دڕکاوی.

**دڕوەدای** (هەورا.): دڕۆکردن.

**دڕۆ:** (هەورا.) دروێ، قەوانە، هەلاّت، هەڵبەست، دەلەسە. (باک.) قر، قرکا، دەرەو. ناڕاستی، پۆت، خوواری، قسەی هەڵبەستراو و ساختە. ـــ کردن: قرکرن. وە ـــ خستنەوە: پرساخووە، بسووندا کشاندن.

**درۆخ:** درۆخانەوە، جۆرە تام و چووزانەوەییێکە لە خواردنی ڕۆنی (بۆیا) دا پەیدا دەبێ کە گەروو و زمان و ناودەم دەچووزێنێتەوە.

**درۆخەدرۆخ:** چووزانەوەی سەرسنگ و دەروون لەسەرمان.

**درۆزن:** ناڕاست، قرقرۆ، قرۆکەر، قرکەر، دەرەوین، دەرەوچین، دەرەوکێر، کەسێکە زۆر درۆیان بکا.

**درۆزنانە:** وەکوو درۆزنان، چتێکە یا ووتەیەکە لە هی درۆزنان بچێ.

**درۆزنـە:** کوێرەکـانی، (هـەورا.) هانەدرۆزنـە، (هـەو.) بووارەکـانی، بەهارەکانی، کانیەکە تەنها بەهاران دەژیتەوە.

**درۆزنی:** دڕۆکردن.

**درۆزنێتی:** قرکەری.

**درۆشم:** شێوە، نیشان.

**درۆڤ** (زا.): ڕوخسار.

**درۆک:** درانێن ئارگووشکێ، دوو ددان لەسەرەوەن دووش لەخوواریێ لـە ژێر چاواندان لـە نێوەڕاستی بڕۆک، کاکیلەی دان هەر لایـەی یـەکێکی لێیە.

**درۆک** (ڕۆژ.): بەرزی، سەربڵندی، شان بڵندی.

**درۆکردن:** ناڕاستی نواندن.

**درۆم** (ئەردە.): ژەقنە.

**درۆوەلەسە:** چاوو ڕاو.

**دروس** (ئەردە.): دروست. ـــ بوون: دروست بوون.

**دروست:** چتێکە بە پێی دەستووری ئاسمانی یا زەمینی ڕەوا بێت، ڕەوا، شیاو، ڕێدراو، ڕاست، کیپ. ـــ بوو: پێکهاتوو، ڕێک کەوتوو. ـــ کردن: چێ کرن. ڕاست، کەسێکە ڕاست بێ و درۆنەکا. ئامادە، ساز، ڕێـک، گەلاّلـە. جووت بـوون، سـوواربوون، ڕەیـی لێـک هـاتن. سـاغ، خـۆش، تەندروست، لەش ساغ. نا ـــ: ناڕەوا، نەشیاو، (باک.) رووشوشتی.

**دروستایی:** ئامادەیی، گەلاّلـەکردن، بۆ چوونـە هەوارگـەکانی کوردستان ـــ کراوە.

**دروست بوون:** ڕەوابوون، ڕێ دران، پێکهاتن. جووتبوون، کۆبوونەوەی پیاو لەگەڵ ژنی خۆی.

**دروستکەردەی** (هەورا.): دروستکردن.

**دروستکردن:** ڕێکخسـتن و پێکهێنـان و سـازاندنی چـەند کەرەسـتەیەک، وەکوو دروستکردنی خانوو یا چاپخانە.

**دروستی:** ڕێکی، پوختی، سازی، ساخی، ساغی. نا ـــ: پیسی.

**دروستیاخۆکرن** (باک.): خۆ ئامادەکردن.

**دروسکردن:** دروستکردن.

**دروسی:** دروستی.

**دروێن:** دوورانن، دروون، دروومان.

**دروێنە:** درەوونە، درەو.

**دروێنەکەر:** (بـاک.) برانـدۆک. پالـە، درەوکـەر، (بـاک.) برانـدووغ، (کە.) درەوەنی.

**دروو** (ئەردە.): دڕۆ.

**درووو:** (دەر.) درەی. زی، قەڵەم، قـەرەم، لاس، (بـاک.) پـەژەل، ستری. درک، ئەستری، دڕی، چقل، قەڵچخ.

**درووەخر:** گیاو دڕوێکی زۆرە کە زەوی داپۆشی بێ.

**درووەزەردە:** چقڵە کەڵموێ، درکە زەردە.

**درووتن** (زا.): دروون، دروێنە.

**درووخانن** (ئەردە.): سووزانەوەی گەروو.

**درووخە** (ئەردە.): تووزانەوە و کاوەکاوی گەروو و دەروون.

**درووخیان:** چووزانەوە و خورانی گەروو.

**دروود:** ڕۆژ باشی، پەیامی خاس.

**دروودالّ:** دڕک و دالّ.

**درووزن:** دڕۆکەر، دڕۆزن.

**دروووشە:** ووروشە، دوریشە، زریوە.

**درووشم:** دڕۆشم، نیشان، مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە. نیشـانەیێکی تایبەتییە کە هـەموو نەتەوەیـەکی ئـازاد هەیـەتی. ـــ ی وولاخ و مالاّتان: داخ. ـــ کردن: داخکردن.

درووشم

**دروشم:** شێوە، درووڤ.

**درووشن:** چتێکە بدرەوشێتەوە، درەخشان.

**درووشێ** (زا.): ئێسکی لوولاک.

**درووشیان:** درەوشانەوە.

**درووشین:** درەوشانەوە.

**درووڤ** (باک.): شکلّ، وێنە، درووشم، ئاوێنە.

**درووکەر** (ئەردە.): ستری برک. چیوتاش، دارتاش.

**درووگە:** (گەر.) دوڕووگە، دورووکە. (ڕۆژ.) لەن. ژیراف، نێقرۆ. ـــ ی گچکە: ناقرۆنک.

**دروومان:** دروون، قرازیان، دروار، (هـەورا.) قراسـەی، واسـەی. دروونی جل و بەرگ و چتی تر بە تەقەلّ.

**دروون:** دوورانـدن، مرازیان، دوورانن، دروێن. دروێنەکردن.

**دروونە** (هەر.): دروێنە.

**دروونەوە:** دووبارە درەوکردنەوە. دووبارە دروومان کردنەوە.

**دروێ** (هەورا.): دڕۆ.

**دروین:** دروون.

**دروێنە:** دروونەوەی گیاو دەغلّ بە داس.

**درهەم:** درەم، پارچە پووڵێکی زێوینی ٥٠ فلس بایی عیراقییە.

**درياز:** گوندێکە لە نزیک مەهاباد.*

**دڕیاگ:** دڕاو، تڵیشاو، شڕ.

**دڕیان:** (کە.) دڕان، تڵیشان. باکردنی وولاّخ و ئاژاڵ لەبەر زۆر خواردنی جۆ و ئیتر.

**دڕیاو** (کە.): دڕاو، شڕ.

**درێخ:** حەیف، پەرۆش، درێغ، کۆتایی. ـــ ی: بەحەیف بوون، پەرۆش خواردن.

**درێژ:** بەرواژی (کورتی)یە، داهۆڵ، کشاو، کێشدار. بە پێچەوانەی کورتە. ـــ کرن: درێژکردن، کشاندن. ـــ بوون: ڕاکشان، نوستن، تخێڵ بوون، سەرنانەوە، پاڵدانەوە، پاڵەوەدان، پاڵکەوتن، پاڵکەفتن. ـــ بوونەوە: دوواکەوتنی کارێک و قەتیس بوونی، کارە کە زۆر درێژ بۆتەوە. ـــ کردنەوە: درێژە پێدان بە قسە یا بەکردەوەیەک.

**درێژا:** درێژایی، درێژی.

**درێژاهی:** درێژایی.

**درێژیی:** درێژی، درێژاهی، (باک.) دووش، باری درێژی لە مشت.

**درێژە:** دوور و درێژ، پەرە. ـــ دان :چێروکەدان.

**درێژەپێدان:** پێدا چوونە خووار، دوور و درێژکردنەوە، لەسەر ڕۆیشتن، هەڵڕشتن، هەڵڕژتن، لێ نەبڕینەوە، درێژکردنەوە.

**درێژەوکردن:** درێژکردنەوە، داکێشان.

**درێژبوون:** ڕازان، ڕاکشان، پاڵ کەفتن.*

**درێژدادڕ** (هەورا.): زۆر بڵێ، چەنەباز، سازندە. ـــ ی: چەنەبازی، سازندەیی.

**درێژداهۆڵ:** مرۆی درێژی لەڕولاواز.

**درێژکردن:** بە پێچەوانەی بەرین کردن. بە زەوی دادانی یەکێک، ڕاکێشان.

**درێژکۆڵە:** چتێکە کەمێک درێژ بێ.

**درێژکێشان** (ئەردە.): تلۆر، تلۆرکەفتن، قنگەوتلۆر، پاڵکەوتن، (ئەردە.) دلوورکەفتن.

**درێژووکە:** درێژکۆڵە.*

**درێژی:** باری درێژایی چت، درێژ.

**دڕێسمە:** ڕێسمە، گرێژەنە.

**درێشە:** (هەورا.) درەوشە.

**درێشیک** (زا.): درێشە.

**درێشووشک** (باک.): درێشووکە، چزوی مار و دووپشک و ئیتر.

**درێشووکە:** (باک.) درێشووشک. چز، چزووی مار و دووپشک و ئیتر.

**درێغ:** درێخ، دیف، کۆتایی.

**درێغا:** دریغ، حەیف.

**درێغ کردن:** کۆتایی کردن لە کارێکیدا.

**درێغی:** درێغی کردن.

**درێڵە:** گیایەکی بەهارییە وەک چاوبازە بەڵام پنجی بچووکترە. دڕکە. (هەورا.) زیپکە، گرمژە.

**درێلەومێکوتە** (هەورا.): زیپکەی مێکوتە.

**دڕێن:** دادڕ، ئەو کەسەیە کە دەدڕێ، چتی دەدڕێنێ.

**دڕی:** دڕک، دڕوو. زووری، زبری. بۆ یەکێکی نەدیو و بزر، لە دڕینەوە دروستکراوە. دڕوو، دڕک، (هەورا.) دڕەی. (ڕەوا.، باد.) جوورە دارێکی دڕاویە بەرەکەی وەکوو گێووژی وایە، (هەورا.) تووتڕک.

**دریست** (باک.): دروست.

**دریف:** دراو، پوول، پارە.

**دڕین:** دادڕین، دڕاندن، تڵیشاندن، دڕاندنی چتی تنراو و هێندێ چی تر. رفتن، مەشق، ڕێگا کردنەوەی ئاو.

**دز:** دەس پیس، دەست پیس، دزۆک، ناپاک، دزەک، ئەبابۆز، دزۆکەر، (باک.) کەلەمە، کرۆکە. دژ، قەلاّ: ڕەواندز، ڕەوەنددژ، قەلاّتی ڕەوان (روح) یا ڕەوەندان.

**دزە:** دزی، پەنهانی، نهێنی. بە ـــ کاری خۆی کرد: بە پەنهانی کاری خۆی کرد.

**دزەباریکە:** باریکە ڕێ.

**دزەخەنە:** زەردەخەنە، لێچ خەنە.

**دزەخورجێنی:** کردنی کارێک یا چتێک بەدزی ئەم و ئەو.

**دزەک:** فڕێن، دزۆک.

**دزەکردن:** خۆدزینەوە.

**دزەیی:** هۆزێکی کوردە لە دەشتی هەولێردا نیشتەجێن.

**دزجار:** شوێنێکە کە دزی زۆر بێ.

**دزدار:** دژدار، قەلاّوان، قەلاّتەوان، کێشکچی دزان و پارێزگار. خاوەند و فەرمانڕەوای قەلاّت. ـــ ی: قەلاّتەوانی، کێشکچێتی.

**دزدەریا:** دزی دەریایە.

**دزدەسەک:** دز دەستەک، دەسکیس.

**دزدەستەک:** دەستکیس، یاریکار و ڕێ نیشاندەری دزان.

**دزدزانێ:** گەمەیەکی منداڵانەیە.

**دزران:** دزی کران.

**دزراو:** چتێکە دز بردبێتی.

**دزکۆژە:** دزشارەوە، کەسێکە دزان پەنا بدات.

**دزکۆژگە:** حاشارگەی دزانە، جێگایەکە دزان چتمەکی دزیاری یا خۆیانی تێدا بشارنەوە.

**دزکۆشکە:** دزکۆژگە.

**دزگا:** دزکۆژگە.

**دزگە:** دزکۆژگە.

**دزگەردەنە** (ئەردە.): جەردە، چەتە، ڕێگر.

**دزگرتی** (باک): دەزگیران.

**دزگیر** (ئەردە.): (ئەردە.) قەرەسۆران.

**دزگین** (باک.): لغاو، دەستەجڵەو.

**دزنەبەر:** چتی هیچ و پووچ و بێ نرخ.

**دزنێرۆ:** شۆفار. ـــ یی: شۆفاری.

دزگین

**دزۆک**: دز.

**دزۆکەر** (باک.): دز. ـــ ی (باک.): دزی، دزێتی.

**دزیار**: دەسکیس، دەستکیس. ـــ ی: دەسکیسی. وولاخ و ئاژاڵ و کەل و پەلی دزراوە.

**دزیاگ**: دزراو، چرییاگ.

**دزیەتی**: دزێتی.

**دزێتی**: ئەبابۆزی.

**دزێو**: ناحەز، ناشیرین، (باک.) بەنۆک. ـــ ی: ناحەزی، ناشیرینی.

**دزی**: پیشەی دزان، ئەبابۆزی، دەست پیسی. ـــ کردن: ئەبابۆزی کرن، دزینی چتی مەردوم. نهێنی، پەنهانی، بە ـــ : بەنهێنی. هێمنی، لەسەرەخۆ.

**دزیتەنی**: کەل و پەل و چتێکە شایانی دزرانی بێ.

**دزی کردن**: ئەبابۆزی و دەست پیسی کردن.

**دزین**: دزی کردن، (ئەردە.) چرپانن.

**دزینەوە**: دزین و کەم کردنەوەی چت کەمکەمە. خۆ ـــ : پاشەکشە کردن، خۆشاردنەوە.

**دژ**: قەلا، قەلات، کۆنگرە، دز، بورج. پیس، بەد، چەپەڵ. درژ: (موک.) کز، مات، خەمگین، بەپەرۆش، نارێک، دامار، دژژ، وەرەز، گرژ. رامێن، بیرکەرەوە. لووش، نەیار، پێچەوانە.

**دژاو**: گیان لەبەرێکە کەم ئاو بخوواتەوە.

**دژایەتی**: بوونی دوو چت بە چەشنێکی وا کە هەرگیز کۆنەبنەوە.

**دژبوون**: کرژبوون، ڕق هەستان، پیس بوون، گرژبوون.

**دژپەسەن** (ئەردە.): دێرپەسەن، دژوارپەسەند، بەدگومان، نیگەران، دوودڵ.

**دژخمان**: دوژمن.

**دژخۆر**: کەمخۆر، (هەورا.) کەموور.

**دژخۆراک**: پیسخۆر، دژخۆر.

**دژدار**: قەلاتەوان، قەلاتدار، نۆبەتچی.

**دژدووێن**: کەمدوو.

**دژران** (جا.): ئالۆزی، کاری سەخت.

**دژکام**: بڕوانە: دوودڵ، نیگەران.

**دژکردن**: مۆن بوون، ناوچاو ترسانن، ڕق هەستان.

**دژمان**: جنێو.

**دژمەن** (هەورا.): دوژمن.

**دژمەنی**: دوژمنی.

**دژمن**: دوژمن.

**دژمناتی** (باک.): دوژمنایەتی.

**دژمناهی** (کۆ.): دوژمنایەتی، دژمناتی.

**دژمنایەتی**: دوژمنایەتی.

**دژمنی**: دوژمنی.

**دژمێن** (دەر.، هەورا.): جنێو، دژان.

**دژوار**: سەخت، حاستەم، گران، پڕچۆرت، تووش، ڕەق، توندوتیژ، دوخشار، دژ، توند، ناستەم، ئاڤزێمکی. توند و تیژ بۆ تووتن و بیبار و چتی وا بەکار دەبرێ. ـــ ی: دژیا، کۆتەک، سەختی، پێسییر، گرانی، دوخشاری، پچڕپچڕ، پچەڕپچەڕ.

**دژوون** (هەو.، خۆ.): دژوێن، چڵکن. ـــ ی: دژوێنی.

**دژوێن** (موک.): (هەو.، خۆ.) دژوون، چڵکن، کەسێکە لەش و جلکی چڵکن و مۆراناوی بێ. جنێو، جوێن. ـــ ی: چڵکنی.

**دژهۆنی**: کۆکردنەوەی دوو ووشە کە دژایەتی بێ لە ناوەندیاندا یا لە ڕستەیەکیدا.

**دژیا** (هەورا.): ئاڵۆز، شێواو.

**دژیی**: مۆنی، کرژی.

**دژێ**: جوورە نەخۆشێکە، کە بە ئاژاڵان دەگا.

**دست** (باک.): دیزەی گەورە، مەنجەڵی گەورەیە.

**دسر** (ئەردە.): ڕێگای تووش و سەختی چیایان.

**دش**: دشگ. بۆ ژنێ خوشکی مێردییە و بۆ مێردیش خوشکی ژنییە، (باک.) باڵتووز. دژ، خراو.

**دشە** (ئەردە.): خراپ، بەد، پیس، چەپەڵ.

**دشۆکە** (دەر.): وورده زیپکە و قنچکەیە.

**دشت**: گەند، بەد، خراو، ناقۆلا. ـــ ە: ناشیرین، بەدی، خراپی، گەندی.

**دشخووارد**: ووردەخشت و خاڵ.

**دشکردن**: خۆ کێشانەوە لە کارێک و دەست لێ هەڵگرتن.

**دشمن**: دوژمن، ناحەز. ـــ ی: دوژمنی، ناحەزی.

**دشوار**: دژوار، سەخت. ـــ ی: دژواری، سەختی.

**دشی**: خراپی، بەدی، پیسی، چەپەڵی.

**دفتەری** (باک.): دەردێکە پشووی مرۆی تەنگ دەکات.

**دفرە** (باک.): بەفیز، بەهەوا.

**دفک**: کوڵ، بە کوڵی گریانێ دەڵێن.

**دفلۆک**: مل پێچ، فانیلە، ژێرکراس. *

**دفن** (باک.، شەم.): کەپۆ، لووت.

**دفناک** (کە.، ڕۆژ.): گوریچە، ئەو قۆرتەیە کە لەناو گۆڕێدا مردووی تێدەنرێت.

**دفنان** (باک.): هۆدانەوە، تۆڵەی چاکەکردنەوە. پسوولە.

**دفنەدفن** (ڕۆژ.): پشوو سوارییە لەبەر زۆر خواردنێ یا نەخۆشی.

**دفن بەران** (باک): کەپۆ بەران، لووت زل.

**دفەدف** (باد.): گڤەگڤ، نێوی دەنگی باو بۆران و تەرزەیە.

**دفەری** (زا.): مرۆی بێ دەم و دوو، بێ دەم و پل.

**دفنزەم** (زا.): مرۆڤی زمان شیرین.

**دفێت** (باک.): بەندو قەیتانی چەرم، سیرمە، دفێل.

**دفێل** (شکا.، نەهـ.): سیرمە، دفێت. (زا.) کونێکە چەرمی سەرپەنجەی نەعلی تێپەڵدەکێشرێ.

**دقدقاندن** (باک.): قدیلکەدان.

**دقدقینی**(باک.): قدیلکەدران.

**دک** (باک.): سەکۆ.

**دکان** (باک.): سەکۆ، کۆسپەی بڵند. دووکان.

**دکانچی** (باک.): دووکاندار.

**دکاندار** (باک.): دووکانچی، دووکاندار. (باک.) ـــ ی: دووکانداری.

**دکراندن** (باک.): ڕێزگرتن.

**دکین** (زا.): چڵکنی کەل و پەلە بە جوورێکی کە بوواردبێتی.

**دگان** (تا.): ددان.

**دگەل** (باک.): دەگەڵ، لەگەڵ، ڤێرە، پێرە. ـــ هەڤ: پێکەوە. ـــ ڤێ چەندی: لەگەڵ هەندی. ـــ ڤێ هەندی: لەگەڵ هەندی. ـــ ڤێ قاسی: لەوکاتەدا.

**دگدگ** (فە.): بالاندنی بزن.

**دگدگان** (باک.): (باک.) دەغدەغان.

**دگدگە**: مەزرەڤێکە لە خولانەوەدا نەیەتە سەردەست.

**دگڵدانە** (بابا.): جاران بۆ بەشەڕدانی کەڵەبابان بەکاردەبرا.

**دگمە** (زا.): دوگمە.

**دگوور** (باک.): جوورە بوورزوێکە.

**دگولیک** (باک.): داپەشکردن، بەشکردن.

**دل** (باک.): دڵ.

**دڵ**: دل، پلە گۆشتێکی سوورە لەبن مەمکی چەپەوە و نیوەراستی هەردووک سیپەلاکەکانەوە، سەری هەمووشادەمارەکان بەوەوەیە خوێن بەویدا هام و شۆیە دەکات. ـــ ئاوخوواردنەوە: دڵنیایی. ـــ بە خۆسووتان: زگ بەخۆسووتان. بە ـــ وداو: لەکانگای دڵەوە. ـــ پێکهاتن: دڵ تێکچوون، چیکڵدانە، تێکچوون. ـــ بۆرین: بووردنەوە، بێهۆشی. ـــ درانەوە: تەوتین. لە ـــ گران هاتن: پێ ناخۆشبوون، گووزهاتن، گووج هاتن. ـــ لەخۆکردن: تووڕە و قەڵس کردن. ـــ لە خێڵەوە هاتن، لە ژیللاهاتن: خێسانەوە، خێورانەوە. لەبەر ـــ : سەبارەت. لەبەر ـــ ان: ڕەزاشیرین، خۆشەویست. ـــ ی من هلداوێژە: دڵم هەڵداوێ. من ـــ ی خووەدایە: خۆشم ویست، بەووردی تەماشام کردن یا بیستن. ـــ ێ وی من گەزتیە: بە خۆشەویستی خۆی شێتی کردووم. ـــ دان: خۆشویستن، لێ ووردبوونەوە. دلێ من لیدچە: دڵمی دەچێتی. ـــ لە دەستدابوون: زۆر ترسان، دڵ لە مەستدابوون. ـــ من لێ روونیشت: دڵم لێداکەوت، دڵنیابووم. ددلێ خووەدا گۆت: بەخۆی کوت. ـــ ی خووە تەڤدان: دڵ و دەروون(وجدان)ی خۆی تاقی کردەوە. دلێ خووە ڤەکرن: بەخشین، دەست گوشادی، دڵفراوانی، بەخشندەیی، دڵی خۆکردنەوە. مەبەس وەیە کە بڕیار لەسەر چتێکی دان. ـــ خووە ڕۆنی کرن: دڵی خۆی پاک کردەوە. ـــ ئاڤێتن: لە بیرو فەرامۆشکردن. ـــ لە خۆچوون: بێهۆشبوون.

**دلاخێف**: گرانی، قاتی و قڕی.

**دلارا**: غەمرەوێن، شوورێنێکە خەم و خەفەتی تێدا برەوێتەوە.

**دلارام**: ئارامی دڵان، دۆست، یار. ناوی ئافرەتانە. ـــ ی: ئارامێتی دڵان، دۆستی.

**دلارێ** (هەورا.): جۆلانەیێکە گوریس و ئیتر لە دارێکی بڵند بخرێ منداڵان بۆ یاری و خۆشرابواردن جۆلانەی پێ بکەن.

**دڵ ئازا**: دلاّزا، ئازا، بەجەرگ، چاونەترس.

**دلآزار**: ئازاردەر، دڵشکێن، دڵ ئێشەر. ـــ ی: دڵشکێنی، دڵ ئێشان، دڵشکان، دڵشکاندن.

**دلامەت**: پایە، شان و شکۆ.

**دلاوەدان**: دڵ ئاوەدان.

**دلاوەر**: دڵنەوا، دڵ لاوێن. ئازا، بەجەرگ، (باک.) دلاوێر، نێوی نێرینانە.

**دلاوەدان**: زۆرزان، تێگەیشتوو.

**دلاوەری**: ئازایی.

**دلاودان**: مەبەس لە گەیاندنی خۆشی یا ناخۆشییەکی زۆر بەدڵی کەسێکی، فیسارەکەس بەو مزگێنییە یا بەو بوختان و توانجە دڵی تەواو ئاوردام.

**دلاوخوواردنەوە**: دڵنیایی، بڕوایی لە کانگای دڵەوە.

**دلاودڵی**: گومان، هەرێنا، دوودڵی، نیگەرانی. بێ ـــ : بێ گومانی.

**دلاورشێنکردن**: دڵکرانەوە بە دیتنی دیمەن یا کەسێکی جوان یا بە مزگێنی و دەنگ و باسی خۆشی.

**دلاوێز**: دڵچەسپ، خۆشەویست.

**دڵ ئێشان**: خەفەتخواردن، شەڕوکێشە. نەخۆشی و ئازار ڕوو لە دڵکردن.

**دڵ ئێشە**: نەخۆشی دڵ، دڵە دەرد، گوڵی گولاوێ بە چابخورێتەوە بۆ دڵ ئێشە زۆر باشە، ترشیش کە بکوڵێ و ئاوەکەی بخورێتەوە زۆر باشە، بڕوانە دڵەکوتێ.

**دڵەباوەڕمەکە**: نیگەرانی، دوروگومانی، هاکوو.

**دڵەپ** (ئەردە.): گوشاد، درێژ.

**دڵەتەپە** (هەورا.): دڵەتەپێ، دڵەکوتە.

**دڵەتەپێ**: دڵەخورپێ.

**دڵەخورپێ**: دڵەکوتێ، دڵەرەپێ، ترسان.

**دڵەخورت**: هێزی دڵ.

**دڵەدەرد**: دەردی دڵ، دڵئێشە، زگ ئێشە، بۆ جنێویش بەکاردەبرێ.

**دڵ دوو** (ئەردە.): دڵ لەدروا، دڵ واپەس.

**دڵەڕاوکێ** (ڕۆژ.، کر.): دوودڵی، نیگەرانی لەکارێکیدا.

**دڵەرەپێ**: دڵەخورپێ، دڵەتەپێ.

**دڵەکەڵەشێر**: جوورە ترێیەکە سپی و دەنک درێژە بنکی ئەستوور و سەری باریکە یەک دەنکە ناوکی گچکەی تێدایە.

**دڵەکزە**: دڵەکوتە، دڵبووردنەوە. دڵەکزی، دڵ تێکچوون بە هۆی خواردنی ئابەدڵ و ئیتر.

**دڵەکزێ**: دڵەکزە.

**دڵەکوتە**: دڵەرەپێ، دڵەکوتێ، دڵ لێدان، دڵەخورپێ.

**دڵەکوتێ**: ناوی گەلابی خووساو لەگەڵ شەکری بخورێ زۆر باشە. دڵەتەپێ، گوڵی گۆرمزە بەیانیان بە چا بخورێتەوە زۆر باشە، گوڵی گیای زمانەگا بکوڵێنرێ لە خورێنی بخورێتەوە زۆر باشە.

**دڵەگورپێ**: دڵەکوتێ، لێدانی دڵ یەک لەسەر یەک بەهۆی خورپە یا ماندوو بوونەوە.

**دڵەلەرزە:** دڵەلەرزێ، دڵەتەپێ.

**دڵەلەرزێ:** دڵەلەرزە، دڵەکوتێ، دڵەتەپێ.

**دڵەدووا** (ئەردە.): چاولەدروا، نیگەران. ــــ یی: چاولەدروایی، نیگەرانی.

**دڵباز:** دڵبەر، دڵڕفێن، جوان، بەلەنجەولار. ــــ ی: دڵبەری، دڵڕفێنی، جوانی.

**دڵبێش** (باک.): بەدبەخت. ــــ ی (باک.): بەدبەختی.

**دڵبەخۆسووتان:** زگ بە خۆسووتان.

**دڵبەر:** ڕووال، دڵستێن، دڵڕفێن، دڵکێش، فریودەر، دڵباز، دڵبەست، لە خشتەبەر، چاقپارسەک، دڵگر، دڵکڕ، خاڵدار. نێوی ئافرەتانە. ــــ ی: دڵبازی، دڵڕفێنی.

**دڵبەرانە:** دڵکێشانە.

**دڵ بەجێ هێنان:** دڵخوازی یەکێکی بەجێ هێنان.

**دڵبەر:** دڵکێش، دڵڕفێن، یار، دۆست.

**دڵبەست:** دڵبەر، دڵڕفێن. نێوی ئافرەتانە.

**دڵبەستە:** کەسێکە ئارەزووی چتێک بکات و دڵی پێیەوە بێ.

**دڵبەستەگی:** بەندیواری.

**دڵبەسیان** (ئەردە.): دڵپڕی.

**دڵبەند:** دڵبەستە.

**دڵ بەیەکاهاتن:** دڵ تێکهەڵاتن، دڵ هەڵشیویان.

**دڵ بردن:** بۆ تێکچوونی دڵ بەکار دەبرێ بەهۆی خواردنی چتێکی نابەدڵەوە وەکوو دەڵێن: هەنگووین یا چێشتەکە دڵی بردم؛ یا دیتنی باغ و گوڵ و گوڵزار و دیمەنانی خۆرسک و جوان دڵ دەباو دەیڕفێنێ.

**دڵبردن:** ئیشتیابوون. دڵنەبردن: ئیشتیا نەبوون.

**دڵبزۆک** (باک.): ژن پەرست، مێ باز، بێ ئایین، دلپارسەک.

**دلبکول** (باک.): دلکول، خەفەتبار.

**دڵبۆرین:** دڵبووردنەوە.

**دڵبووردنەوە:** دلبۆرین، دڵەکوتێ لە ترسان یا لە خۆشیان یان لەبەر بەزەیی بە کەسێکی داهاتن.

**دلبی** (زا.): جوورە هەنجیرێکە.

**دلپارسەک** (باک.): بێ دین، ژن پەرست، مێ باز، دلبزۆک. ــــ ی: ژن پەرستی، مێ بازی، دلبزۆک.

**دڵپاک:** دڵڕاست، دلقەکری، بە پێچەوانەی دڵپیس. ــــ ی: دڵڕاستی.

**دڵپاکێتی:** دڵڕاستێتی.

**دلپەرژێر:** پەسند، لەبەر دڵان. ــــ ی: پەسندی.

**دلپەریتی** (باک.): بەدبەخت، چارەڕەش، فەلەکزەدە.

**دڵپڕ:** کەسێکە بە خەفەت دڵی پڕ بووبێ نزیک بێ بگری، دڵتەنگ، بەرق، ڕقدار، زگ پڕلە بۆق. کەسێکە زۆری خواردبێ و دڵی پڕ بووبێ. ــــ بوون: ڕقداری، دڵتەنگ بوون بە جوورێکی وا کە نزیک بێ بگری. زۆر خواردن بە جۆرێکی وا کە سەردڵ بکەوی. ــــ ی: دوراری، دڵتەنگی، گرانایی سەردڵە بەهۆی زۆخواردنەوە.

**دڵپیاچوون:** حەزکردن لە چتێک.

**دڵپیاکاهاتن:** دڵ پێکداهاتن، دل تێکهەڵاتن.

**دڵ پێسووتان:** بەزەیی پێداهاتن، زگ پێ سووتان.

**دڵپێکاهاتن:** دڵ تێکچوون، چیکڵدانە تێکچوون.

**دڵپێوەبوون:** دڵ بە چتێکەوە بوون.

**دڵپیس:** بەدگومان، تارینەر، دوودڵ، نیگەران. ــــ بوون: بەد گومان بوون، نیگەران بوون. ــــ کردن: بەدگومان و نیگەران کردن. ــــ ی: بەدگومانی، نیگەرانی.

**دڵتاریک:** (باک.) دلتاری، بێ بەزەیی، دڵڕەق. ــــ ی: (باک.) دلتارینی.

**دڵتەپین:** گەشکە لێ هاتن.

**دڵتەخت:** دڵنیا. ــــ ی: دڵنیایی.

**دڵتەڕ:** کەسێکە کە زۆر حەز لە چتی جوان بکات. پیری ــــ: تەڕپیر. ــــ ی: حەز لە چتی جوانکردن.

**دڵتەنگ:** خەمناک، خەفەتبار، کز، بەپەرۆش، بێ چیکڵدانە، خۆنەگر، دڵنافرە. ــــ بوون: خەفەتباربوون، دڵهەڵاتن. ــــ کردن: خەفەتبارکردن. ــــ ی: خەمناکی، خەفەتباری.

**دڵ تێ چوون:** حەز لە چتێک کردن.

**دڵ تێکچوون:** دڵ تێکهەڵاتن.

**دڵ تێکهەڵاتن:** زافکردن، دڵ بەیەکاهاتن، بە جۆرێ کە نزیک بێ لە ڕشانەوە.

**دلجگەر** (فە.): جەرگ و ناو، جەرگ و دڵ.

**دڵجۆ:** لاوێنەوە، دڵدەرەوە. ــــ یی: لاواندنەوە، دڵدانەوە.

**دڵچەپەڵ:** دڵپیس، بەدگومان. ــــ ی: دڵپیسی، بەدگومانی.

**دڵچەسپ:** دڵگر، چتێکە بچێتە دڵەوە.

**دڵچوون:** ویستن، حەزلێ کردن، دڵویستن، خۆشویستن، مگێز، ئارەزووکردن. بێ هەست و بێ هۆش بوون.

**دڵچوونەسەر:** حەز کردن.

**دڵخاڵی:** خورێنی، ناشتا.

**دڵخاوبوونەوە:** دڵ تێکچوون و سست بوون.

**دڵخەفەبوون:** دڵتەنگ بوون، دڵ کلافەبوون، دڵداگیریان.

**دڵخۆر** (ئەردە.): دڵتەنگ. (ئەردە.) ــــ ی: دڵتەنگی.

**دڵخۆش:** خەنی، شاد، کەیفخۆش، خەرۆ، پشکووتوو، ئاغووش، گەش، (باک.) دلخوەش، هاش. شاد. ــــ بوون: پشکووتن، (باک.) بتر، دڵکرانەوە، گەشبوونەوە. ــــ ی: شادمانی، کەیفخۆشی. ــــ کردن: گەشکردنەوە، کەیفخۆشکردن، خۆشی گەیاندن بەدڵی کەسێکی.

**دڵخۆشکەرە:** مایە و هۆی دڵخۆشی.

گەشکردنەوە، کەیفخۆشکردن، خۆشی گەیاندن بەدڵی کەسێکی.

**دڵخۆشی دانەوە:** تەبتاندن، دڵدانەوە، حەجماندن، خەفەت ڕەواندنەوە لە دڵی...، ئاشت کردنەوە، دڵنەوایی کردن.

**دڵخووا:** دڵچەسپ، دڵخوواز.

**دڵخوواز:** داخوواز، مراز، داخوواز، داخاز، داوخوواز، ئارەزوو، ئاوات، ویست، نیاز، (باک.) ئارۆزە، چتێکە دڵ ئارەزووی بکا. ـــ ی: ئارەزووکردن، دڵداری.

**دڵخووەر** (ئەردە.): خەفەتبار، دڵشکاو. (ئەردە.) ـــ ی: خەفەتباری، دڵشکاوی.

**دڵخووەش** (باد.): دڵخۆش.

**دڵخوریان:** دڵ شڵەژان، دڵ ڕاچەنین.

**دڵخورد:** دڵگیر. کەسێکە لەیەکێکی دڵگیربووبێ. ـــ دڵگیری.

**دڵداخوریان:** خورپە لە دڵکەوتن، داخورپاندن، دڵڕاچەنین.

**دڵداخورپاندن:** خورپە لە دڵ خستن، داخورپاندن.

**دڵداخورپیان:** خورپەلە دڵ کەوتن، داچڵەکان.

**دڵدار:** ئازا، نەترس. گراو، سەوداسەر، دۆست، سەوداگەر، دۆستک، سەودادار، گێژگول، دڵبەر.

**دڵدارانە:** گراوانە، پەخشان و هۆنراوەی دڵداری.

**دڵدارێتی:** حەزلێکەرێتی.

**دڵداری:** دەلالەت، حەزلێکەری، دڵخوازی. ـــ کردن: حەزلێکردن.

**دڵداکەفتن:** دڵداکەوتن.

**دڵداکەوتن:** دڵدا خورپیان، تەکانخواردن، دڵداخوریان.

**دڵداگ** (ئەردە.): کەسێکە دڵی دوای چتێکی کەوتبێ و بۆی شێت و شەیدا بووبێ، شەیدا.

**دڵدان:** خۆشویستنی. بە ووردی بیستن یا چاو تێ بڕین.

**دڵدانەوە:** دڵخۆش کردن، دڵنەوایی کردن، لاواندنەوە، تەبتاندن، حەجماندن.

**دڵدەرەوە:** دڵنەوا.

**دڵدەرهاتن:** دڵفڕین.

**دڵدرانەوە:** تەوتین.

**دڵدرێژ:** پشوودرێژ.

**دڵدز:** دڵبەر. ـــ ی: نهێنی ناودڵ، دڵبەری.

**دڵڕاس:** دڵڕاست. ـــ ی: دڵپاکی.

**دڵڕاست:** دڵپاک. ـــ ی: دلپاکی.

**دڵڕاگیرکردن:** پارێزگاری کردنی دڵی یەکێک لە زیزبوون.

**دڵڕەبەن:** بێ گووێ، خۆ تێ نەگەیێن، یارمەتی نەدەر.

**دڵڕەش:** ناپاک، دەغەڵ، تەپرەش، دڵڕەق. ـــ بوون: ناپاک بوون. ـــ ی: ناپاکی، دۆگمان، دڵڕەقی.

**دڵڕەق:** بێ بەزەیی، نامیهرەبان، بێ باک. ـــ ی: بێ بەزەییێتی، نامیهرەبانێتی، بی باکی.

**دڵڕەنج:** زویر، زیز، دڵشکاو. ـــ ان: زیزبوون. ـــ اندن: دڵشکاندنی یەکێک.

**دڵڕفێن:** دڵبەر، دڵفڕێن. ـــ ی: دڵبەری.

**دڵڕۆیین:** بێهۆش بوون، دڵچوون، دڵ بیاوان بوون.

**دڵڕوون:** دڵخۆش، بەهومێد، هەویادار. ـــ بوون: بەهەویابوون. ـــ کردن: دڵخۆش کردن، هەویادار کردن. نێوی ئافرەتانە. ـــ ی: مزگێنی، هەویاداری.

**دڵڕێش** (ئەردە.): دڵبریندار، دڵێشاو، دڵڕەنج.

**دڵزار:** خەفەتبار، نێوی نێرینانە.

**دڵسارد:** ناهومێد، (باک.) دلسار، چاڤ ترسەنۆک، دوودڵ. بێ بەزەیی. ـــ بوونەوە: ناهومێد و دوودڵبوون. ـــ کردنەوە: ناهومێد و نیگەران کردن. ـــ ی: ناهومێدی، چاڤ ترسەنۆکی، دوودڵی.

**دڵسەخت:** دڵڕەق، دێودڵ، دڵکوچک. ـــ ی: دڵڕەقی، دێودڵی، دڵ کوچکی.

**دڵسەرد:** دڵسارد ،ناهومید، تەراسیاگ. ـــ ی: دڵساردی.

**دڵسەندن:** مەبەس لە هۆگرکردنی کەسێکە بە چەشنێکی وا دڵی لێ ئەستێنرابێ.

**دڵستێن:** دڵبەر، دڵڕفێن. ـــ ی: دڵبەری، دڵڕفێنی.

**دلسڤک** (باک.): سووک، هەرزە. (باک.) ـــ اهی: سووکێتی، هەرزەیی. (باک.) ـــ ی: سووکی، هەرزەیی.

**دلسۆتی:** دڵسووتاو.

**دڵسۆز:** دەربەست، میهرەبان، جەرگسۆز، جگەرسۆز، خەمکەی خەمان، خەمخۆر، جەرگسۆز، دلسووژ. نێوی نێرینانە. ـــ ی: میهرەبانی، جگەرسۆزی، جەرگسۆزی، دڵسووژی، دەربەستی.

**دڵسووتان:** کۆست کەوتن، ناهۆمێدبوون، جەرگسووتان، بەزەیی پێداهاتن.

**دڵسووتاندن:** دلسووتاندن، وە بەزەیی خستن.

**دڵسووتاو:** دلسۆتی، (باک.) دلشەوتی، جەرگبڕاو. بەزەیی دار. ـــ ی: ناهومێدی، جەرگبڕاوی.

**دڵسووتیاگ** (ئەردە.): دڵسووتان.

**دڵسووتیان** (ئەردە.): دڵسووتان.

**دڵسووتێن:** جەرگبڕ، پشت شکێن.

**دلسووژ** (باد.): دڵسۆز. ـــ ی: دلسۆزی.

**دلشا:** دڵشاد.

**دڵشا:** دڵشاد.

**دڵشاد:** کەیفخۆش، شاد، خەرو، دڵخۆش، سەر و دڵخۆش. ـــ ی: شادی، کەیفخۆشی، شادمانی، شادی، سەر و دڵخۆشی.

**دلشار:** تازە و نووێ کەرەوە.

**دلشەوتی** (باک.): دڵسووتاو، دلسۆتی.

**دڵشکان:** دل ئێشان.

**دڵشکاندن:** دلهشتن، دڵ ئێشاندن.

**دڵشکاو:** دلشکەست. ـــ ی: دلشکەستی.

**دڵشکەست:** دڵشکاو، دڵڕەنجاو، دڵ ئێشاو. ـــ ی: دڵشکاوی، دڵڕەنجان، (باک.) دڵشکاو، ناقایل.

**دڵشکە** (ئەردە.): دڵشکستە.

**دڵشکستە:** دڵشکاو. دڵشکە، دلخووە.

**دڵشکستی:** دلخووەری، دڵشکاوی.

**دڵشکیان:** دڵشکان، دڵ ئێشان، دڵخوەری.

**دڵشکێن:** دڵڕەنجێن.

**دڵغەلینەک** (باک.): ڕشانەوە.

**دڵفراوان:** پشوودرێژ و هێمن و لەسەرەخۆ. ـــ ی: پشوودرێژی و هێمنی و لەسەرە خۆیی.

**دڵفرە:** دڵفراوان، بەخشندە. خۆگر، پایەدار. ـــ یی: دڵفراوانی، بەخشندەیی. خۆگری، پایەداری.

**دڵفرێن:** دڵبەر، دڵکێش، دڵگر. نێوی ئافرەتانە.

**دڵقەکەر** (باک.): دڵکەرەوە، نیشتیاهێنەر. (باک.) ـــ ی: ڕاست، پاک، دڵپاک، دڵڕاست.

**دلق:** چەشنە درێکەوە (وول) ی دەچێ بەرێکی سووری ڕەوانی هەیە. (باک.) بار، شێوە، دۆخ، پاودان، چلۆنی، چلۆنێتی، حاوایی.

**دلکەتی:** گراو، سەوداسەر، دڵدار.

**دلکەچک** (باک.): ترسەنۆک.

**دلکەش:** دڵکێش. ـــ ی: دڵکێشی.

**دڵکەفکردن:** دڵهەلچوون.

**دڵکرانــەوە:** (بــاک.) بــتر. شــادمان و دڵخۆشــبوون، کەیفخۆشــبوون، دڵگوشادی.

**دڵکراوەوە:** شادمان، دڵخۆشبوون، کەیفخۆشبوون.

**دڵکریاوەوە:** دڵکراوەوە.

**دڵکرمـن:** نیگـەران، بـەدگومان، دوودڵ. ـــ ی: نیگـەرانی، بـەدگومانی، دوودڵی.

**دڵکرمۆڵ:** دڵکرمن، دڵپیس، دڵچەپەڵ. ـــ ی: دڵکرمنی.

**دڵکرمێ:** دڵکرمن.

**دڵکریانەوە:** دڵکرانەوە، دڵوازبوون.

**دڵکلافەبوون:** دڵداگیران، دڵخەفەبوون، دڵتەنگی، دڵکوشران.

**دلکۆچەر** (بـاک.): ناپایـەدار، بـێ ئـایین، دووررووزی. (بـاک.) ـــ ی: ناپایەداری، بێ ئایینی.

**دڵکورکان:** ئارەزوو کردنی چتێک، دڵ لێدان بۆ چتێک.

**دڵکورکیان:** دڵکورکان، هەوەسکردن.

**دڵکوژتن:** دلکوشتن.

**دڵکوژی:** دڵکوژتن.

**دڵکوشتن:** دلکوژتن.

**دڵکول:** دلکول، (باک.) دلبکول. خەمگین، پەرۆشدار، خەفەتبار.

**دڵکێــش:** دڵگــر، دڵگــیر، دڵکــەش، دڵبــەر، دلرفێــن، (بــاک.) بەشەنخوەش. دیەنی ـــ: دیەنی خۆش و دڵگر. نێوی ئافرەتانـە. ـــ ی: دڵگیری، دلبەری، دڵکەشی، دڵڕفێنی.

**دڵگا:** جەرگە، ناوەڕاست، ناوچە.

**دڵگــەرم:** خووینەگــەرم، ســەرگەرم، بــە جــۆش و خــورۆش. ـــ ی: خوورێنگەرمی، جۆش و خورۆش، سەرگەرمی.

**دڵگــەش:** دڵگر، دڵکێش. ـــ ی: دڵکێشی، دڵگری.

**دڵگەوپێدان:** دڵ لێدان، بەهۆی دڵەوە هەستکردن.

**دڵگـر:** خۆشەویست، دڵکەش، دڵکێش، (باک.) بەشـەنخوەش، نێوی ئافرەتانە. دیەنی ـــ: دیەنی دڵکێش و خۆش.

**دڵگران:** مرۆی تووڕە و سڵ و ڕەزاقورس، لالووت، سەرگران، خەفەتبار. ـــ ی: تووڕەیی و سڵی و ڕەزاقورسی.

**دڵگری:** دڵکێشی.

**دڵگوشا:** دڵگوشاد.

**دڵگوشـاد:** دڵکـەرەوە، شـوێنێکە کـە دڵـی تێـدا بکرێتـەوە. ـــ ی: دڵکرانەوە، خەم بەبادان.

**دڵگـیر:** دڵگـر، دڵکێــش، دڵگوشـا. دڵمـەند، خەفـەتبار، دلـایی، بەپەرۆشی، زیز، زویر، تووڕە، دڵگران، دڵتـەنگ، دڵخـوەر، دڵڕەنـج، دڵمن. ـــ ان: خەفەتبار و دڵتەنگ بوون.

**دڵگیری:** دڵڕەنجی، پەرۆش، خەفەتباری، دڵگرانی.

**دڵ لەخۆکردن:** تووڕە و قەڵس کردن، لەخۆ زوویرکردن.

**دڵ لـەدڵدان:** بـە گومـان و دردۆنـگ و نیگـەران بـوون. دڵ لـەدڵ مـەدە: نیگەران مەبە.

**دڵ لێچوون:** حەز لە چتێک کردن، شێفتەبوون، حەسپەن بوون.

**دڵ لێدان:** دڵ هەلاویژتن، دوودڵی، نیگەرانی.

**دڵ لێ سـەندن:** ڕاکێشـانی دڵـی کەسـێک بـە ووتـە و کـردەوە و شـێوەی شیرین.

**دڵمان:** زوویربوون، بە پەرۆشبوون، خەفەت خواردن. (موک.) دڵی ئێمە.

**دلمانی:** پەرۆش، خەفەت، دڵگیری.

**دلمایی:** پەرۆش، دڵگیری، خەفەتباری.

**دلماین** (زا.): دڵشکان.

**دڵمەزن** (باک.): مەرد. ـــ ی: مەردی.

**دڵمەن:** دڵمەند.

**دڵمەند:** دلمن، دڵگیر، دڵگران، دڵڕەنج. ـــ ی: دڵگیری، دڵگرانی.

**دلمەیی** (باک.): دەڵمە، نیوەبرژاو.

**دڵمردگ:** دڵمردوو، بێ دڵ.

**دڵمردن:** مەبەس لە یەکێکە، کە بە تەواوی بەدڵ وازی لـە هـەموو چتێکی خۆش و جووان و شۆخ و شەنگانی ناو گێتی هێنابێ.

**دڵمردوو:** خۆپارێز، هەریسە، تاییە، دنێ بەردا، کۆلدر، دارەسە، هـەریس. ـــ یی: دڵمراندن، واز لە ئارەزوو و هەوا هەوەس هێنان، پارێزگاری.

**دلی** (باک.): دەڵمەی هێلکە و چتی تر.

**دڵنەبردن:** بـێ نیشـتیایی، هەوەسـی خوواردنـێ و... نـەبوون. نیشـتیا نەهێنان، هەوەسی خوواردنێ و... نەکردن.

**دڵنەخووا:** دڵنەخوواز.

**دڵنەخوواز:** دڵنەخووا.

**دڵنەرم:** میهرەبان. ـــ ی: میهرەبانی.

**دڵنەمان:** بێهۆشبوون، سام گرتن، ترسان.

**دڵنەوا:** میهرەبان، دڵسۆز، دڵنەواز، دلاوەر.

**دڵنەواز:** دڵدەرەوە، دڵنەوا. ـــ ی: دڵنەوایی، دارانەوە، دازیایی.

**دڵنەوایی:** ئاشت کردنەوە و خەفەت لابردنی یەکێکی، دڵنەوازی، دڵنیایی، دڵخۆشی دانەوە.

**دڵنزم:** پەست، خۆبەکەمزان، خۆبەکەمگر، هێمن، سەرشۆڕ. ـــ ی: پەستی، خۆبەکەمزانین، خۆبەکەمگرتن، هێمنی، سەرشۆڕی.

**دلنگان** (باک.): لاپرسەنی، کەسێکی وایە بە بێ بانگهێشتن کردن بچێتە سەر سفرەی ئەم و ئەو.

**دڵنیا:** پشتڕاست، (باک.) قیمە، فەریقەت، پشتقایم، کەسێکە، کە لەکارێکی دوودڵ و بەدگومان نەبێ. ـــ بوون: پشتڕاست بوون. ـــ کردن: پشتڕاستکردن. ـــ یی: دڵ ئاو خواردنەوە، پشتڕاستی، قیم، دڵنەوایی، دڵنیابوون.

**دڵوپەس** (ئەردە.): دڵەودووا، چاوەدووا، نیگەران. (ئەردە) ـــ ی: دڵەودووایی، نیگەرانی.

**دڵواز** (ئەردە.): دڵگوشاد. (ئەردە.) ـــ ی: دڵگوشادی.

**دڵوەش** (هەورا.): دڵخۆش، شاد. (هەورا.) ـــ ی: دڵخۆشی.

**دڵۆ:** قۆرت، خەش، لەغ، گرێ، شکست.

**دلۆپ** (باک.): دڵۆپ.

**دڵۆپ:** (باک.) دلۆپ، تکەی ئاو و هەموو جوورە شلەمەنیەک.

**دڵۆپە:** ئەو تنۆکە ئاوانەیە کە بەهۆی بارانە و بەفرەوە لە میچی و نەشکەوتان دەتکێتە خوارەوە، (باک.) دلۆپ، (ئەردە.) چکە، (هەورا.) تکە. تنۆکە، تکەی بن میچ لەبەر بەفر و باران. ـــ ووشک بوون: چکان، چک بوون. ـــ ووشک کردن: چکاندن، چک کردن.

**دڵۆژمار:** دڵۆپەژمێر.

**دڵۆپەژمێر:** دڵۆپەژمار، تکێن، تنۆکار، چپ بۆڕی.

**دلۆرە** (هەو.): ڕاکشان.

**دڵۆڤان:** دۆست، خۆشەویست، بەزەیی، میهرەبان. ـــ ی: میهرەبانی، بەزەیی داری.

**دلۆق** (هەورا.): بلۆق، پۆرگ، تۆربەی ژەهری.

**دڵ و بار** (هەورا.): دڵ و دەروون.

**دڵ و دەروون:** (هەورا.) دڵ و بار.

**دڵ ویەهەر** (هەورا.): جەرگ و دڵ.

**دڵ ویستن:** دڵخوواز، ئارەزووکردن، حەزکردن.

**دڵهاتنەیەکا:** دڵهەڵشێوان.

**دلهاندن** (باک.): ترساندن، زراوبردن.

**دلهاووردن:** بڕوایی، ئیشتیاهێنان، ویستن.

**دلهەبوون** (باک.): ئارەزووکردن.

**دڵهەلاتن:** دڵتەنگ بوون، دڵ لەمژێڵلاهاتن، خێسانەوە، خێورانەوە.

**دڵهەلاویزتن:** دڵ لێدان.

**دڵهەڵمەنگووتن:** بێز و بۆ لێ کردن.

**دڵهەڵچوون:** خێورانەوە، دڵکەفکردن.

**دڵهەڵشێوان:** دڵ تێکهەڵاتن.

**دڵهەڵشێوانەوە:** دڵ هەڵشێوان.

**دڵهەڵشێواندن:** دڵ تێکهەڵێنان.

**دڵهەڵشێویان:** دڵ تێکهەڵاتن، دڵ هاتنەیەکا، دڵ بەیەکا هاتن.

**دڵهەڵکەفتن:** دڵهەڵکەوتن، دڵ گەڕیانەوە، دڵ گیربوون، دڵگران بوون، دڵ تێکچوون.

**دڵهەڵکەنران:** دڵهەلقەنران، ناهومێد و دڵساردبوونەوە.

**دڵهەڵکەنراو:** دڵسارد، ناهومێد.

**دڵهەڵکەوتن:** لە پێش چاوکەوتنی چت.

**دڵهەڵکنیاگ** (ئەردە.): دڵسارد، ناهومێد، دڵهەڵکەنراو.

**دڵهەڵکنیان** (ئەردە.): ناهومێدی. دڵساردبوون.

**دڵهەڵگرتن:** ددان بە جەرگی خۆدانان.

**دلهشتن** (زا.): دڵشکاندن.

**دلهشک** (باک.): بێ بەزەیی، دڵڕەق. ـــ ی: دڵڕەقی، بێ بەزەییتی.

**دلهۆنامای** (هەورا.): دڵهەڵاتن.

**دڵهێشە** (باک.): دڵێشە، دڵ ئێشە.

**دڵهێنانەجێ:** دڵنەوایی کردن.

**دلهین** (باک.): تێ ڕامان، چاوتێ بڕین.

**دڵێ** (هەورا.): ناو، نێو، دوڕ، هەندوڕ، لەناو. ـــ دەر: ناو دۆژە (جەهەندەم).

**دڵێ دەستی**(هەورا.): ناودەست، لەپی دەست.

**دلێر:** ئازا، پاڵەوان.

**دلێراسە** (هەورا.): نیوەڕاست، (هەورا.) نیمەنە.

**دلێراسێ** (هەورا.): نیوەڕاست.

**دلێراسینە** (هەورا.): براتووتە، قامکی تەنیشت تووتەڵەیە.

**دلێراسینێ** (هەورا.): دلێراسینە.

**دلێرانە:** ئازایانە.

**دلێری:** ئازایی، پاڵەوانی.

**دڵێشە:** دڵ ئێشە، نەخۆشی دڵ.

**دڵێق:** دلیق.

**دلێم:** شاری دلێم لە بنچینەدا(دەلێم)ە و کوردییە و دوور نیە دەیلەمیەکانبن، کە ئێستا لە عیراقیدا بوونە یا کراونە عەرەب.

**دڵێ یانە** (هەورا.): ناوماڵ، نێوماڵ، کەلوپەل.

**دلی** (هەورا.): بەو. ـــ ڕەنگە: بەوڕەنگە.

**دلیار** (فە.): ڕاستبێژ، دەست لەملدەر، تەماشاکار. (فە.) ـــ ی: ڕاستبێژی، دەست لەملدان، تەماشاکردن.

**دڵی پێ:** جێگا قوولاییە نەرمەکەی ژێر پێیە.

**دڵی دەردە** (ئەردە.): دڵەدەرد.

**دلیق:** دلق، بەری گوڵەباغێکی سوورە و بۆ ڕەوانی باشە.

**دلین** (باک.): هەست و خۆشویستن.

**دلیوان** (فە.): تەبەنە، (ڕۆژ.) دەرزی پینەچیان.

**دم:** زار، دەم، دەو، دەڤ. (ڕۆژ.، فە.) کلک، دووگ، دونگ. ـــ ی مەڕ: دووگی مەڕ، ـــ ی هەر: کلکی کەر. (خۆ.، مامە.) کەپۆ، لووت. (فە.) دمە: دووگ.

**دما:** (ڕۆژ.، هەورا.) دووایە، پاشی. ـــ ی مەرگ: دووای مەرگ. جەو ـــ : لەوە دووا.

**دمارەکۆڵ:** دووپشک.

**دمارەکۆڵە** (ڕۆژ.، هەورا.): دووپشک.

**دماڕۆ** (هەورا.): دوواڕۆژ.

**دماکەوتە** (هەورا.): دوواکەوتوو.

**دمالەکۆڵ:** دووپشک.

**دمانکردن** (باک.): بەکرێ گرتنی دەیەکی دێهات و چتی دی.

**دماوە** (هەورا.): دووایی.

**دمایی** (هەورا.): دووایی.

**دمە** (دمە.) (هەورا.، فە.، کە.): دووگ. دەمە، دەوە. ـــ گوویزان، دەمەگوویزان.

**دمەد** (زا.): شیشەتووتن.

**دمەک** (ئەردە.): دمبەک.

**دمەک دریاگ:** ئاوەسوو، بێ ئابڕوو.

**دمەگوویزان** (دەر.): دەوەگوویزان.

**دمەڵ** (ئەردە.): دومەڵ.

**دمەڵان** (ئەردە.): دومبەلان.

**دمەهۆسناگێ:** کلک هەڵتەکێنە، کلک هەڵسەنگێنە.

**دمبەک:** دوودەک، (کە.) دمبک، (هەورا.) دمڵەک، دمبەڵەک، دومبەڵەک، تەپڵ، دمەک.

**دمبەڵەک:** تەپڵی گچکە.

**دم بڕیاو** (کە.): کلک بڕاو.

**دمبک:** دمبەک.

**دمبڵی دمباو** (ئەردە.): دەنگی دەهۆڵییە.

**دمخووار:** کەوچە، کەوچەر.

**دمدار** (کە.، فە.): کلکدار.

**دمدم:** قەڵای دمدم، ناوداره و چیرۆک و مێژووی ئاشکرایە.

**دمڕاست:** ڕیش سپی، ڕیسپی، سەرۆک. ـــ ی: ڕیش سپێتی، سەرۆکێتی.

**دمڕخ** (موک.): مرازێکە لە زەوی و بێستانانەدا بەکاردەبرێت.

**دمزل:** گارمشە دەم.

**دمسەنجنەک** (فە.): کلک هەڵتەکێنە (باڵندە).

**دمک** (هەورا.): نووک، نووکی پێنووس و هەر چتێکی بێ. ـــ ی باڵندان: دندووک.

**دمکانە:** (ڕەوا.) دووکانە، (هەورا.) دەلووکانە.

**دمگرتن** (کە.): کلک بڵندکردن، کلک هەڵگرتن (بۆ وولاخی بەرزە بەکاردەبرێت).

**دمڵەک** (هەورا.): دمبەک.

**دمێڵ** (هەورا.): قوونێر.

**دن** (باک.): ئیدی، دیکە، تر، ئیتر، ئێدن، ئیدیکە، ئیکە. (ئەردە.) جنچکان.

**دنا:** خێڵێکی کوردی یەزیدییە لەناو ئێلی (میلی) دایە لەسەر هێڵی وێران شاری.

**دنان** (کە.): (لو.، کرما.، فە.) ددان. داڕووجان.

**دنە:** هان. ـــ دان: هاندان، تاوتێدان، تاودان.

**دنج:** ئارام، ئاسوودە. ـــ ی: ئارامی، ئاسوودەیی.

**دندان** (زا.): ددان.

**دندک** (باک.): تۆوی کاڵەک و شووتی و چتی دی.

**دندووک:** دمک، نکل، دەنووک. ـــ لێدان: تکتکاندن.

**دنگ** (هەورا.): پڕ، تژی، دینگ. چتێکە لەدار یا لەبەردی قووڵ هەڵکەنراوە، برنج و ساوار و دانەوێڵەی تێدا دەکوترێ. (زا.) دەنگ. (باک.) تەقە.

**دنگە:** پایەی باریک یا ئەستوور کە لە کەرەستەی قوڕ و گێچ و چیمەنتۆ و بەرد و خشت دروست دەکرێ نەک لەدار، فیل پایە.

**دنگ بوون:** مەبەس لە تێرخوواردن و وورگ و تەشک پڕکردن.

**دنگ بێژ** (باک.): گۆرانی بێژ، دەنگخۆش.

**دنگچی:** دنگ کوت، ئەو کەسەیە بە دەسک و دیبەگ برنج و دانەوێڵە بکوتێ.

**دنگ کوت:** دەسکی دنگی، پاکوت.

**دنگلافستان** (باک.): جۆلانە.

**دنگلهەڤ** (باک.): جۆلانە.

**دنوو** (باک.): ددان.

**دنێ** (باک.): دونیا.

**دنێب** (باک.): زیوانی نێو دەغڵی.

**دنێ بەردا:** دڵمردوو، تاییە، هەریس.

**دنیا** (ع.): گێتی، جیهان، کەیان، چەرخ، گەردوون، چەپگەرد، ڕۆژگار.

**دنیاداری:** خەریکی پەیداکردنی سامانی جیهان بوون، ماڵداری.

**دنیا دیتوو:** جیهان گەڕاو، کەسێکە لە گێتی شارەزابێ.

**دنیانەدی:** بەرچاو تەنگ.

**دنیای بوچک:** گەردوون.

**دنیای گەورە:** کەیان، کەیهان، جیهان.

**دنیایی** (هەورا.): کار و بەرخ.

**دهۆک:** شارێکی کوردانە لە بادینانەدا.

**دوێل** (باک.): سیرمە.

**دۆ** (سوور.): دوو. خۆشەویست، یار. ماست و ئاوی تێکەڵاو کە لەناو مەشکەدا ژەنرا و ڕۆنەکەی لێ دەرهێنرا بەوەی کە دەمێنێتەوە ـــ ی پێ دەڵێن، دەو، ئاودۆ. کە ئاوەکەی زۆر بێ کەواو و کە زۆر ڕوون بێ گۆڕاوی پێدەڵێن. دەوڵەت، سامان، بەرووبوو، لە ـــ کەوتن: لە سامانکەوتن.

(باک.) دوورێنی، دۆهـ. بەش، بەهرە، پش، پشک، ئەو ئافرەتەی کە لە ڕەشبەڵەکێدا دەستی هەر پیاوێکی بگرێ دەبێتە ـــ ی وی و ـــ ی پێدەڵێن.

**دۆبە** (باد.): ڕەواقی هەنگووینییە، ڕاوی هەنگووین و بەشیرە و شیلەی هەموو چتێکی شل دەڵێن.

**دۆبەسەرە** (هەو.): سەر بەدۆنە، چەند پنچکە گیایەکە پێکەوە دەڕوێن.

**دۆبەکەشت:** (هەو.) دۆ بەکەشک.

**دۆبەکەشک:** دۆبەکەشت.

**دۆبڕ:** شووم، دوومۆر، لەکاتی خۆیدا بۆ کەسێک بەکار براوە کە ماڵاتەکەی خۆی هەموو بفرۆشێ و بێ دۆ بمێنێتەوە.

**دۆبرە:** پنجە گیایەکە بە تۆپ گەزێک پتر بڵند دەبێ، لک و کەدەکانی وا دەچنە پاڵ یەکتری دەڵێی بە کوتکی لێدراوە و بە پێیان پەستراوە، گوڵیشی شینە.

**دۆبردە:** بەریش، نەخۆشێکی ماڵاتانە گووانی دێشێ و شیریشی ووشک دەکات.

**دۆبڕی:** شوومی، دوومۆری.

**دۆبیە** (شکا.): ڕەواقی هەنگووینی.

**دۆپ** (شا.): کەندێکە قووڵ یا نزم بێ کە کەنارەکانی بەرزبێ، دۆڵ و دەرە دۆڵ.

**دۆپەڕۆ:** پشکی مەشکە.

**دۆت** (ئەردە.، جەبا.): کچ، کەنیشک.

**دۆتە:** کچ.

**دۆتر** (باک.): ئیدی، ئیدیکە.

**دۆتمام** (جەبا.، باک.): ئامۆزا، کچەمام.

**دۆتمیر:** کچی میری، پرەنسیس.

**دۆتن** (باک.): دۆشین، بدۆشە.

**دۆچ:** گیایەکی بەهارییە بە گژ دەغل و داناندا دەچێ و کزی دەکا.

**دۆچن** (ئەردە.): چتی لنج، چەپ، تۆچن.

**دۆخ** (ئەردە.): چتی تیژ و توند، تون وتووژ وەکوو بیبار. ئامرازێکی شەڕییە. دۆخین. بار، باودان، چۆنێتی، چلۆنێتی، چاوایی: ڕۆژگار لە ـــ ی خۆی نەماوە. کات، هەڕەت، تاف، تەمەن: لە ـــ ی لاوێتیدا: لە هەڕەتی لاوێتیدا. دەسکی کەوچک و ڕۆن پێژ و ئیترە. پلە، پلەکان.

**دۆخاو:** گێچی شلی گیراوەوە.

**دۆخە:** مانگا یا بزنێکە بەدەست سپارد بدرێ بەکەسێکی بۆ ئەوەی تا ساڵێکی شیرەکەی بخوا و دوایە بیداتەوە دەست خاوەندی، سەری بە ئەندازەیەک ڕۆن یا پارە دەستێنرێ.

**دۆخەوا** (هەورا.، جا.، سل.): دۆکوڵیو، دۆخوا.

**دۆخەوە:** دۆکوڵیو.

**دۆخووا:** (ئەردە.) دۆکوڵیو.

**دۆخڕشمە** (باک.): دەستەوسار، هەوسار.

**دۆخمان:** (دزە.، بابا.) دوورزمان. ـــ ی: دوورزمانی.

**دۆخۆر:** ئاژاڵی بە ئامانەت، کە شیری بخۆن و بیدەنەوە بە خاوەنی. *

**دۆخووا** (ئەردە.): دۆخەوا.

**دۆخووین** (باک.): دۆخین.

**دۆخهەفسار** (باک.): دەسکەوسار.

**دۆخیان:** هەڕەت، تاف.

**دۆخیانەت:** هەڕەت، تاف.

**دۆخی ڕێشمە:** دەسکی هەوسار.

**دۆخین:** دۆخووین، دۆخ. (هەورا.) گونجەنە، هەوجەنە. (دەر.) بەنشرواڵ، بەنەخووین، بەندۆخین، هۆجە، بەندەخووێن، بەنشەروال. بدۆخیناخووەکارین، لەخۆڕادیتن، بەخۆخوڕین.

**دۆخینی سست** (باک.): سووک، حیز، بێ ئابڕوو، بێ نامووس.

**دۆدانە:** دەوشک. مەشکەیەکە، کە دۆی تێداهەڵدەگیرێ. یا توورەکەی دۆیە.

**دۆدکا** (باک.): ناوی هۆزێکی کوردە، دۆدا گوندێکە لە ڕۆژهەڵاتی (عامموودە ـ ئامودە) دا.

**دۆدۆ** (باک.): (باک.) زۆزۆ. دوو دوو. ناوی مرۆڤێکی ڕاوکەر و ناودارە پێشینیان لەسەریان گوتووە. بارام وەک دۆدۆمێ قوڵنگڤانە.

**دۆدی و بۆدی** (موک.): تەشقەڵە.

**دۆر** (باک.): نۆبە، نۆرە. دەهۆڵ.

**دۆراخ:** گیایەکە بەتۆو دەچێنرێت و گەڵای ورد و بۆنخۆشە لەناو کفتە و دۆ و تۆراغی دەکرێ بۆ بۆنخۆشی. (ڕەوا.) هۆ و مایەی ناوی تۆراخیش هەر لەوەوەیە، کە دۆراخی تێدەکرێت.

**دۆڕان:** ڕاوکە ورنکردنی مریشکە و بەناچاری هێلکە لە شووێنێکی تر بکات. زیانکران، لەدەستچوونی چتێک بە قومار یا لەگرێو و چتی تردا.

**دۆڕاندن:** زیانکردن، لەدەستچوونی چتێک بەهۆی قومار، گرێو یا چتێکی ترەوە، دارنان، لەکیس چوواندن، زیانکردن بەتایبەتی لەقومارێدا و هەرچتێکی لە کیس بچێ، دارنان، تێشکان، خچان، خرچان. پی ـــ: خستن، زیان پێکردن، تێشکاندن.

**دۆڕاو:** خچاو، زیانکراو، خرچاو.

**دۆرەدانە** (هەو.): ئەوجێگایەیە، کە لە ئاشی گەنمی لەسە ڕۆدەکەن.

**دۆرەدای** (هەورا.): دەورەدان.

**دۆرەمەڕ** (بالی.): بێر، ماڵاتدۆش.

**دۆربەند** (باک.): چووارچێوە.

**دۆرژنگ:** قورمی خانوو، تۆز و دووکەڵی دیوار و بنمیچانە، کە شۆڕ دەبێتەوە.

**دۆرک** (ئاک.): کوللێرە.

**دۆرکا** (باک.): ئێلێکی کوردە لەناو ئاشیتا لە ڕۆژهەڵاتی قامیشلوویە.

**دۆرمەدۆر** (باک.): چوارکەنار.

**دۆرنج:** قورمی خانوو.

**دۆری:** (کۆ.) دۆریە، گیایەکی پەلک پان و گوڵزەرد و ووردە بە تۆپ دەری دەکات و دەشخورێ، وەکوو ڕێواس وایە نێوەکەی کلۆرە.

**دۆریە** (کۆ.): دۆری، گۆنۆڕ.

**دۆریخە:** (هەو.) گوڵەی دەرکێ. (خۆ. باد.) جۆگەلە ئاوێکە لەنێو تووتن و بێستانجاراندا، کە ئاوی وی هەموو دووکان و دێراوەکان بگرێتەوە.

**دۆز** (باک.): داخوازی. (هەو.) دوورەوە، ئەو کەسەیە کەوش و چتی تر دەدروێتەوە. (باک.) هۆ، مایە، بۆنە. خۆ بە زیرەک و خۆشخوو نواندن. ئامانج. (باک.) داوا، خواستن.

**دۆزەخ:** جەهەننەم، دۆژە، ئارتوون.

**دۆزەخە:** دۆزەقە.

**دۆزەرەوە:** داهێنەر.

**دۆزەق** (ئەردە.): دۆزەخ.

**دۆزەقە:** (باک.) دۆژەدار، (کۆ. باد.) پۆسکە، (رەوا.) پۆزگە، (هەورا.) زەمبوورەک، (جا.) دەمنەی ئاسیاو، تەختەیێکە لەژێر دۆڵاشی ئاشیدایە نیوەڕاستەکەی کونە ئاوی بە هێزەوە لێ دێتە دەرێ لە پەرەی ئاشی دەدا و دەیسووڕێنێ.

**دۆزدار** (باک.): خۆ بە زیرەک و خۆشخوونووێن.

**دۆزراوە:** چتێکە دۆزرابێتەوە، دیترابێتەوە.

**دۆزکردن** (باد.): داواکردن.

**دۆزین:** مەبەس لە نۆرینی بەرگی دژوێنە بۆ مۆریانە و ئیتر، پشکووناندن، پشکووینەوە. لێ کۆڵینەوە و پشکنینی کەسێکی بە قسە.

**دۆزینەوە:** پەیداکردنەوە، دیارکردنەوە، ئاشکراکردنەوە، بەسەر گرتنەوە، دەستکەوتنەوەی چتی گومبوو، دیتنەوە بۆ وولاخ و ئیتر. گردان، بەسەر هەڵبوون، دیتنەوە، بیناندنەوە، ئەدیتن. داهێنانی و پەی بردن بە چتێک، کە لەوە پێش نەزانرابێ.

**دۆژ** (بۆتا. جز.): ئاوور، ئاگر. جەهەننەم، ئاگرخان. (ئەردە.) دووری.

**دۆژار** (بل.): قەڵەمشتی کێوان.

**دۆژە:** جەهەننەم، دۆزەخ، ئارتوون، ئاگرخان، ئاوورگە، ئاوورخان.

**دۆژەدار** (باک.): دۆزەقە.

**دۆژەن** (ئەردە.): بڕوانە: دۆژەنک.

**دۆژەنەدەر** (رەوا.): شوێنێکە ئاوی پێدا ڕۆدەچێتە خوارەوە و لە شوێنێکی تردا سەرهەڵدەدات.

**دۆژەنک:** دۆژەنگ، دارێکی درێژی زەمانەدارە لەکاتی مەشکەژاندنێدا لە لۆرە لەب ( لۆلەپەکان ) دەخرێ.

**دۆژەنکە:** دۆژەنک.

**دۆژەنگ:** چرچی ناوچاوان، لۆچی ناوچاوان.

**دۆژزر** (باد.): دۆزەقە.

**دۆژم** (گژ.): دەڵێم، ئێژم، دێژم، (هەورا.) ماچۆ.

**دۆس:** دۆست، یار، هاودەم، خۆشەویست.

**دۆسایەتی** (هەورا.): دۆستایەتی.

**دۆست:** (هەورا.) خۆشەویست، یار، یۆر، دۆستک، گێژگوڵی، داباش، دەستیار، دڵدار، کەسێکە ئاشناو خۆشەویست بێ، ئاشنا، برادەر، ئاسیاو، هاواڵ. ـــ انە: برادەرانە، یارانە، خزمانە.

**دۆستایەتی:** (باک.) دۆستینی، ئاشنایەتی، برادەرایەتی، یارێتی، دڵدارێتی.

**دۆستک** (باک.): دڵدار، نازدار، دۆست.

**دۆست و دۆ** (کۆ.): کەسووکار، دۆست و خزم.

**دۆستی:** دۆستایەتی، دۆسی، ئاشنایی، برادەری.

**دۆستنی:** دۆستایەتی.

**دۆس و برا** (هەورا.): دۆست و برا.

**دۆسی:** دۆستی.

**دۆش** (باک.): گێژ. ـــ بوون: گێژبوون. (باک.) جووڵان، بزووتن. (هەو.) گۆشتی پاش ڕان و نزیک دووگی ئاژاڵ.

**دۆشاب** (باک.): دۆشاو.

**دۆشاف** (باد.): دۆشاو.

**دۆشانی** (باک.): دۆشینی مانگا و ئیتر، ئاژاڵێکە بدۆشرێ.

**دۆشاو:** (باک.) دۆشاف، (شار. هەورا.) شۆک، مۆتی. ـــ ی کولاو: (باک.) جەلاقی، بە شیرەی کولاوی ترێ و خورما و توو و ئیتر دەڵێن.

**دۆشاوچکچکە:** گڵە سپی لە شیلەی دۆشاو دەکرێ تا شیرین بێ، خۆڵەکە دەنیشێتە بنی و دۆشاوەکەی لێ هەڵدێنجن تا دەگاتە قوڕەکە ئەوجار بنەکەی لەناو ڕاوکێ دەکەنەوە لەناو کۆڵی داری دادەنێن و بەردێکیشی لەسەر ڕۆدەنرێ تا ئاوی ناو قوڕاوەکەی بپاڵێوێ و بتکێتە ناو مەنجەڵێکی ئەو ئاوە لە هەموو دۆشاوێکی شیرینترە و پێی دەڵێن دۆشاوی چکچکە، هەر دۆشاوێکی گڵی سپی تێ نەکرێ شیرین نابێ بەڵکوو مزر دەبێ.

**دۆشاومژە:** قامکی تەنیشت قامکی گەورەی دەستییە، قامکی دەست لە مل دان، قامکی گەواهی.

**دۆشاوی:** جوورە ترێیەکی سپیی درێژکۆڵەی زۆرشیرینە. چتێکە ڕەنگی وە دۆشاوی بچێ.

دۆشاومژە

**دۆشەک** (هەورا.): دۆشەگ.

**دۆشەکە** (هەورا.): دۆشەگ.

**دۆشەگ:** ژێر ڕایەخێکی پڕ لە لۆکە یا خوری یان پەڕ و چتی تر بۆ لەسەر نوستنێ، دۆشەک، دۆشەکە.

**دۆشەگەڵە:** دۆشەگی گچکەیە تەنها بۆ لەسەر دانیشتنێ بەکاردەبرێت.

**دۆشەمە:** جوورە دۆشەگێکە بە کورسی دانیشتنیدا دادەکوترێ.

**دۆشەنی:** ئاژاڵ و ڕەشە وولاخی شیردار، کە بۆ دۆشین بەکاردەبرێت.

**دۆشتن:** دۆشین.

**دۆشدامان:** دامان و بیرکردنەوە لە چتێک.

**دۆشداماو:** کەسێکە دامابێ و بیر لە چتێک بکاتەوە.

**دۆشراو:** مێیینەیەکی گیانداری بە شیرە، کە شیرەکەی دۆشرابێ، دۆشیاگ.

**دۆشک** (ئەردە.): دۆشەگ.

**دۆشکەڵە:** دۆشەگەڵە.

**دۆشیاگ** (ئەردە.): دۆشراو.

**دۆشیدەنی:** دۆشەنی، دووشا، ئاژاڵ و ڕەشە وولاخی شیردار.

**دۆشین:** دادۆشـین، شـیردەرهێنان لـە گوانـی شـیردار، دەسـت بـە گوانداهێنان. لێ بردنەوە، پارە و کەل و پەل بـە چاپلووسی و زمانلووسی لە کەسێک ئەستاندن.

**دۆعا:** نزا، نزوولە. ئەفسوون، جادوو، نشتوو.

**دۆغاو:** دۆخاو، بە هەردوو واتا.

**دۆغەوا:** دۆخەوا، دۆکولێو.

**دۆغرەمە:** خواردەمەنیەکە لە ماست و خەیاری ئەنجنراو دروستدەکرێ.

**دۆق:** پارچە تنراوێکی ڕەشە ژنان دەیکەن بە عابا. (زا.) کوتەک. (دزە.) زللەی پڕ ملیێیە، (هەورا.) پڕملە. سوورمە یا سیمێکی چنراوی بەرینە، بە کەناری عابایەوە دەدروون بۆ جوانی.

**دۆک** (باک.): دووک. خلتـە و کـەف و کولـی ڕۆنـی قـاڵکراوە، دۆن، (هەورا.) دووەک، (بابا.) دۆوک، (باک.) بنـدۆک. (مـوک.) دۆکـە، نەخۆشییێکی شینایی و دارانە، پەلکەکانیان سپی هەڵدەگـەڕێ و ڕەق و ووشکیان دەکا ئەوەش یا لەبەر زۆر ئاوی یا کەم ئاوی یا بوغ یا لـەبـەر پڕی گەلایان پەیدا دەبێ، چارەی ئەوەیە، کـە ئـاوی زۆربـێ لێی کەمکرێتـەوە و هەمووی هەر بەو چەشنە.

**دۆکە** (سۆ.): دۆک.

**دۆکەشک:** دۆی کەشکی سوواوەوەیە. چێشتێکیشە لـە دۆی کەشـک و برنج دروستدەکرێ.

**دۆکتـۆر:** پلەیـەکی زانسـتییە دوای پلـەی بـەکالۆریۆس و ماجسـتەر وەردەگیرێ. پزشکێکە لە دەرد و دەرمانی نەخۆشان سەری دەربچێ.

**دۆکولێو:** چێشتێکە برنج یا سـاواری لـەناو دۆ یا ماسـتاوێدا لـێ دەنێـن، دۆخەوا.

**دۆڵ** (بـاک.): چـەرخ و پێچکـی عارەبانەیـە. (بـاک.) هێلمێکی سـەوزە لەسـەر لکـی دارانـی هەڵدەسـوون باڵندەی پێوە دەبێ. (باک.) بێچووی مالات و ئاژالانە. (هەورا.، کە.) دار یا بەردێکی قووڵە گەنم و ساواری تێـدا دەکوتـرێ، (مـوک.) جۆنـی. (ڕەوا.) شـۆڕ؛ سەگێکی کلکی خۆی شۆڕ بکاتەوە دەڵێن کلکی دۆڵ کردووە. (موک.) شیو، خانۆک، گەری، دەرە، گەلی، گـەروو، گوهۆڕ، نەقەب. دۆڵـی ئـاش دارێکی ئەسـتووری نێوهووڵۆڵە. (هەو.) دەهۆڵ. بـەتاڵ، چـۆل، تـەنها لەکاتی بێ دانیی ئاشدا بەکاردەبرێ، ئاش دۆڵە: ئاش بەتاڵە، بێ دانە.

دۆڵ

**دۆلاب:** پلان، پیلان. چەرخی ئاوێ، غەرغەرە.

**دۆلابە:** کونێکی گەورەیـە لـە سەربانی ئاشییەوە دادەهێلرێ تا لـە ڕێـوە (نیٚ)دا بهێلرێتە خووارەوە.

**دۆلاب:** ــ ی قاپان، دۆلابی کاسە و چەمچە لەولەب، (باک.) چیکەنە.

**دۆلابرێس** (باک.): ئەو کەسەیە برێسێ.

**دۆلابرێسک** (باک.): باڵندەیەکە.

**دۆلاش:** (ڕەوا.) قەم، دۆڵ، دۆڵیانە، قۆتەرەی ئاشی، قۆتەڵە، گـەوورک، سوولاش، نای، قۆتەڵەی ئاشی.

**دۆلاخ:** پووزەوانە.

**دۆلاڤ** (باد.، باک.): چیکەنە، چێتێکی خڕە و پانە خوری و لۆکـەی پێ با دەدەن، (باد.) دۆلاب.

**دۆڵاو:** بەردی قووڵی پڕ لە ئاو، چالاو. بیر، دۆڵیان، دووڵە.

**دۆڵاوچە:** دۆلاب.

**دۆڵە:** دۆلاوە، گۆل، گۆلاو.

**دۆڵە** (ئەردە.، هەورا.): تەبەکی دارین، تەشت، سووێنە. (هەورا.) دۆڵ. کوول.

**دۆڵەتۆراخ:** تۆراغدان، تۆراغان.

**دۆڵـەدان:** (ڕەوا.) دروادۆل، دروایـی هـاتنی دان لـە دۆڵـی ئاشـیدا و بـۆ دروایی هاتنی هەموو چتێکی بەکاردەبرێ.

**دۆڵەدرێژ:** قامکی بالابەرزە.

**دۆڵەدۆڵ** (ئەردە.): دەڵەدەڵ، جوولـەجوولْ، لەرەلەر.

**دۆڵەمە** (ئەردە.): دەڵەمە وەکوو هێلکەی کەم برژاو.

**دۆڵەمەر** (خۆ.): بێلی ئاسن، خاکەناز، پێمەڕە.

**دۆڵەسرنا** (ئەردە.): دەهۆڵ و زوڕنا.

**دۆڵەمێ:** دۆڵـەمەی هێلکە.

**دۆڵەنگێو:** دەهۆڵژەن.

**دۆڵەهەویر** (ئەردە.): تەبەک.

**دۆڵبە** (شکا.، باک.): پالاخ، گوێلکی گامێشییە، (هەورا.) پەڵخە.

**دۆڵچە:** سەتڵی گچکە لـە چەرم یا لـە خامی ئەستوور دروستدەکرێ تا قوڕ و ئاوی ناو بیرانی پێ هەڵێنجن، (کە.) دۆڵکە.

**دۆڵدرێژ:** ئافرەتێکە لەسەر لنگ بێ یا ئەندامی شەرمی هەڵزرابێ.

**دۆڵک** (باک.): دۆڵی گچکە.

**دۆڵکـە** (ڕەوا.): شـەربەی چینکـۆی زارفـرە و دەسـکداری ئاوییـە، بـە کاسـەیێکی گچکـەی قوولـی مسـین یا تەنەکـەش دەڵێـن، کـە ئـاوی پێـدە خورێتەوە.

**دۆڵمە:** نژلۆنک، نووچاو، هەڵپێچراو.

**دۆڵمک:** دۆڵـمەی گچکە.

**دۆڵمەجەرگ** (ئەردە.): مووار، (میمبار) ڕیخۆڵەی ئاژالانە پڕ دەکرێ لـە گۆشت و برنج و بۆ خواردن هەڵدەگیرێ.

**دۆڵیان:** (نێ) ی ئاشییە، دۆڵدان، دۆڵیدان. ئاوی بارانە، کە لەناو بەردی قووڵ دادەمێنێتەوە و ڕێبوواران لێی دەخۆنەوە، دۆڵە، دۆلاو.

**دۆڵیانە** (کە.، ڕۆژ.): دۆلاش، (بابا.) ئـەو شـووێنە، کـە دانـەی ئاشـی تێدەکرێ..

**دۆڵیدان:** دۆڵیان.

**دۆم:** کەلاشکەر، کەلاشچن، (موک.، شنۆ.، خۆ.) هـەندوو، دوو تیرەیـە: دۆم، کە کەلاشی دەکەن. دۆمە ڕەشکە: بێژنگ و چەقۆ و تیرۆک و چتی وا دروستدەکەن. (ئەردە.) دەهۆڵژەن، دەوروڵژەن.

**دۆمادۆر** (باک.): چووار کەنار، چواردەور.

**دۆماست** (بار.): ماستاو.

**دۆمانە** (ئەردە.): گورگەلۆقە، گورگە.

**دۆمە:** بەرماڵی دەوار.

**دۆمەلان:** (هەو.) دۆمبەلان.

**دۆمەدۆم** (باک.) : گوللەی ئاگر گرتن و ئاوور پژێن.

**دۆمیرەکی**: چەپ و ڕاست: جۆرە بافتە یا نەوارێک بووە جاران لە کەناری بەرگیان دەدروو.

دۆمینە

**دۆمینە**: جۆرە قومارێکە.

**دۆن**: تووخوون، قەرە، نزیک، قەوورخە. چەوری ڕۆن، گوزوو. دۆک. (باک.) خڵتە و کەف و کوڵی ڕۆنی. (کە.) پینە، پارچە. بار، چەشن، چۆنێتی. (ڕۆژ.) پەی، ڕێگە. کەوتە ــ : پەی پێ برد، ڕێگای بردەسەر.

**دۆناگازی**: نەفت.

**دۆنانە** (کە.): وەکوو پینە، وەکوو پارچە.

**دۆنە** (کۆ.): گایەکە زۆر ڕەشبێ.

**دۆندرمە**: دۆڵدرمە، بەستەنی، چلوورە.*

**دۆنگز** (جا.): زنج، لە زەل دروستدەکرێ.

**دۆنی**: دوورێنێ.

**دۆو**: دۆ، کە دۆش لە ماست و ماستیش لە شیر دروستدەکرێ.

**دۆوانە**: دۆدانە.

**دۆوخاو**: دۆغاو مەبەس لە گرتنەوەی گێچە بە جۆرێکی زۆر تەڕ وەکوو دۆ لەناو درزی دیواران و گومبەزی دەکرێ تا درزەکە پڕکاتەوە و گەورەتر نەبێ.

**دۆوخەوا**: دۆکوڵیو.

**دۆوراخ**: شوویت.

**دۆورنج**: دورژەنگ، گوژەنگ، قرم، دووکەڵ و تۆزێکە بە بن میچی خانووی قوڕدا بە زۆری شۆڕ دەبێتەوە.

**دۆوزەخە**: دۆوزەقە، ئەو شوێنەیە لە بن ئاشیدا ئاوی پێدا دەڕوات بۆ دەرەوە.

**دۆوزەقە**: دۆوزەخە.

**دۆوژەنگ**: نێرک، دارێکە کەمێ پان و باڵێک پتر درێژ و زمانەدارە هەردوو سەری زمانەکانی لە کونی ئەرخوت (لۆلەپ) دەخرێت بۆ ژاندنی مەشکە دۆوژەنکە.

**دۆوشان**: دۆشینی ئاژاڵ و ئیتر.

**دۆوشاو**: دۆشاو.

**دۆوشکە**: سیرێج، سیرێژ، دۆیەکە بخرێتە سەر ئاگر، کە بزرکا ئاوەکەی دەپاڵێورێ، دۆیەکەی کە وەکوو پەنیرە دەکرێت بە کەشک. دۆینە.

**دۆوک**: (موک.) دۆک، چڵک و کەف و کوڵی کەرەی گەرم کراوە. (باک.) دۆ.

**دۆوکە**: چتێکی سپی و لینجە دەدا، لە هێندێ شینایی بە تایبەتی لە بامیە و توتن و لە کاریان دەخا.

**دۆوڵ**: دنگ، دینگ. دۆڵ، درە، شیوە.

**دۆوڵەمی**: دەڵەمەی هێلکەی.

**دۆوڵیان**: سەرنێ و تەندووری ئاش. ئەو شوێنەیە لە ئاشدا دانەوێڵەی تێدەکرێ بۆ هاڕین.

**دۆوم**: دۆم، کەلاشکەر.

**دۆە** (باک.): دوورێنێ.

**دۆی ترش**: دژی قژەکەر.

**دۆینە** (ئەردە.): دوورێنی. (هەو.) دۆکوڵیو، دۆینی، داندۆک، چێشتی داندۆک بریتییە لە بروێش لەگەڵ دۆ بە ووشک کراوەیی، کە دەکرێتە چێشت ــ ی پێدەڵێن.

**دۆیها** (هەو.): کسکس، (موک.) حەلەلەلە، هەلەلەلە. بۆ تێکبەردانی سەگان بەکاردەبرێت.

**دۆیین** (ڕەوا.): دۆکوڵیو.

**دوبارە** (زا.): فێڵ، تەفرە.

**دووبەندی** (باک.): دووبەرەیی، دووچینی، دوودەستەیی، دووکۆمەڵەیی، دەستەبەندی، دەسەبەندی.

**دوچار** (ئەردە.): دووچار.

**دوتایی**: بڕوانە: دووتایی.

**دوخان** (باک.): دوو، دووکەڵ. دەرد، خەفەت، داخ.

**دوختەرکەمیانوو**: کابانی ژیر و دەسترەنگین.

**دوخشار** (ئەردە.): سەخت و گران، دژوار.

**دوخشار پەسەن** (ئەردە.): دێرپەسند، دژپەسند.

**دوڤۆ** (باک.): دوو، ٢. دووجار دوو دەکاتە چووار.

**دوڕ** (ڕەوا.، بار.): نیسو، دەنیسو، لەنیو، بنی. بەردێکی نرخدار و گرانبەهایە لە بنی زەریایە دێنرێتە دەرەوە، گەوهەر، مرواری. زیرەک، ووریا، دیواندڕ. نزیک، توخوون؛ ــ ی ئاکسان مەکەوە: توخوونی ئاکسان مەکەوە.

**دوڕاجی**: هۆزێکە لە کورد.

**دووراقە** (باک.): ماوە، مەیدان.

**دوڕە**: بەگیان لەبەرێکی دەڵێن، کە دایک و باوکی لە جسنێکی نەبن. (دزە.) دوڕڕە. دوورەگ، دووڕەنگ. (خۆ.) بزنێکە لە نێوانی مەرەز و مووی دابێ.

**دوڕەگ**: دووڕەک.

**دوڕەسەگ**: (هەورا.) باسکەسەگ.

**دوڕەشێر**: جانەوەرێکە لەنێوانی سەگ و پڵنگیدا پەیدا دەبێ.

**دورد**: خڵتەی مەی و شلەمەنی تر. ــ ی: مقەست.

**دورزی**: ئێلێکی گەورەیە لە چیای دورزی داخ و لە لوبنان و فەلەستین دادەنیشن دەڵێن کوردن، خانەوادەی جان پۆلاد (جان بلاط) گەورەی وانن، ئەو خانەوادەیە لە شاری (کلس) لە کوردستانی بندەستی ترکاندا دەربەگێکی گەورەیان ڕێکخستووە. شەرەفخانی بەدلیسی لە شەرەفنامەدا دەڵێ: (امارەتی درزی) بەڵام زۆر موخابین ناڵێ درزی، درزینی چوونە کووێ.

**دورس** (ئەردە.): دەست لێ نەدراو، ساخ، پاک. (ئەردە.) دروست، بەجێ، بەجێگە. (ئەردە.) دوروستکار، پاکداوێن. ــ بوون: ڕێک کەوتن، سازبوون.

**دورسکار**: مەردومی ڕاست و پاک داوێن. ــ ی: داوێن پاکی، سەر ڕاستی.

**دورسکراو**: دروستکراو، ساز و ئامادەکراو.

**دورسکردن:** دروستکردن، سازکردن.

**دورقەدوورق** (ڕەوا.): قدەقد.

**دورگە:** ساختەچی، فێڵباز.

**دوڕگە:** بڕوانە: دوڕووگە.

**دوروزی:** بێ ئایین، بێ دین، دڵکۆچەر.

**دوروس:** دروست، دوروست. ــ ی: دورستی، ساخی، پاکداوێنی، ئامادەیی.

**دوروست:** ڕێک.

**دوروستایی:** دروستایی، ئامادەیی، سازبوون.

**دوروست بوون:** دوروس بوون.

**دوروستکردن:** ڕێکخستن، چاک کردنەوە، ساخ کردنەوە، دروستکردن.

**دوروستی:** دروستی.

**دوروشکە:** عەرەبانە، گەردوونە. ــ چی: عەرەبانەچی، گەردوونەچی.

**دوروک** (باک.): مێژوو.

**دوڕووگە:** دووڕووگە، دوڕووگر، گراف، (کە.) دوڕگە، (ڕۆژ.) لەمن، ووشکاییێکە دوولای ئاوبێ یا هەر چوارلای ئاو بێ.

**دوروومان:** دروومان.

**دوڕێزان:** هەڵبەست، شیعر.

**دوروێنە:** دروێنە.

**دوروینە:** دروێنە، درەو، دوورینەوەی دەخڵ و دان.

**دوڕی:** دوڕڕی، سپی و ڕوون و تروسکەدار وەکوو دوڕڕی.

**دوریش** (باد.): لوولاک، لە ئەژنۆوە تا قوولاپە.

**دورین:** دروون.

**دورینەوە:** دروونەوە.

**دورینگە:** زەویەکە هەڵزی ڕووابێت، کە گیایەکەی لێ دروا‌وە (دورینگە) ی پێدەڵێن.

**دوژ:** دژ، پێچەوانە.

**دوژە:** دژزەخ.

**دوژەنگ** (ئەردە.): چینی نێوچاوان.

**دوژەنگ یەکدان:** برۆ ترشانن، ناوچاو گرژ کردن.

**دوژمن:** (باک.) قومسی، (خۆ.) تاسب، (موک.) نەتەوی، خەنیم، نەیار. دژمن، ناحەز، قاندڕ، بەدخووا، مێمڵ.

**دوژمنایەتی:** نەیارێتی، دژمناتی، ناحەزی، دژمناهی.

**دوژمنی:** نەیاری، ناحەزی، دوژمنایەتی.

**دوژن** (باک.): جنێو.

**دوژنکەر** (باک.): جنێودەر.

**دوژوار:** دژوار.

**دوژێن** (ئەردە.، گۆ.): جنێو.

**دوژێندان** (ئەردە.): جنێودان.

**دوژێنفرۆش:** جنێوفرۆش، خراوێژ، دەم لەق. ــ ی: جنێوفرۆشی.

**دوژێنکار:** جنێوفرۆش.

**دوساخ** (هەورا.): بەندی، دیل، گیراو. دوستاخ.

**دوساخچی:** وستاخچی، بەندیوان، بەنی وان، زینانەوان، زیندانەوان، دوساخووان.

**دوساخ خانە** (هەورا.): بەندیخانە، وستاخخانە.

**دوساڵە:** بۆ هەمموو چتێک بەکاردەبرێ، کە دوو ساڵ بەسەریدا تێپەڕی بێ.

**دوستاخ:** بەندی، دیل، گیراو، گیریاگ، دوساخ. ــ چی: بەندیوان، بەنی وان، زینانەوان، زیندانەوان، دوساخووان.

**دوستاخ خانە:** بەندیخانە، گرتووخانە، دوساخ خانە.

**دوشت** (ئەردە.): درشت، گەورە، زل.

**دوشک** (باد.): سەکۆ.

**دوشمن:** دوژمن. ــ ایەتی: دوژمنایەتی. ــ ی: دوژمنی.

**دوف:** دووا، پاش. (باک.) کلک.

**دوفدرێژ:** بێ پایان، دوور و درێژ.

**دوفرۆفی:** کلکە ڕێوی، گیایەکە. *

**دوفک:** کلک، دەسک.

**دوکان چەفتی** (لو.): چتی خووار و خێچ و شەفتوول و قەنگاس.

**دوکلە** (ئەردە.): دوروکەڵ.

**دوگەم:** تەختە دەوارێکە لەبەر باو و باران و سەرما بە زستانان لە دەوری ڕەشماڵانەوە دەگیرێ.

**دوگمە:** گۆیکەی داران. جوورە چتێکی خڕ یا درێژۆکەیە ئێخەی سینگ و بەرۆک و سەر قۆڵی پێ دادەخرێت. توکمە، گۆ، گۆیک.

**دوگمەودۆڵاب:** خشڵێکی زێڕین یا زیوینی پلپلە دارە ئافرەتان لە لێواری سیخمەی قایم دەکەن و لە خووار مەمکیانەوە دادەخرێت.

**دوگمەوقەیتان:** دەستەیەکە لە دوگمە و قەیتان لە لێواری سیخمە دەگیرێ بۆ داخستن.

**دوگمەی تیر:** تیری دوگمەدار.

**دوگمەی یەخە:** گۆ، گۆی ئێخە.

**دوگون** (لو.): گرێ.

**دولبەر:** دڵبەر. ــ ی: دڵبەری.

**دولپی** (باک.): دوورپشک.

**دوم** (فە.): کلک.

**دوما** (هەورا.، لور.): دووا، پاش. ــ هی: دووایی.

**دومایی:** دووایی، دوماهی.

**دومەقەسک** (باک.): باڵندەیەکە.

**دومەک:** دمبەک، دمبەڵەک.

**دومەڵ:** (هەورا.) دومپەل، مەرێژە. قوونێر، ئاشین، (باک.) پەقپەقۆک، پەقیژۆک، گرێ و برینێکی بە سۆی لەشە.

**دومەڵان:** (هەو.) دومبەڵان.

**دومەڵەک:** جوورە دەهۆڵێکە سەرێکی پان و سەرێکیشی تەسکە، چەرمی خاوی تێدەگیرێتە سەرە پانەکە لە بنەنگڵ دادەنرێ و لەزەماوەندا لێدەدرێ.

**دومەڵەکژەن:** دمبەک لێدەر.

**دومبەلان:** جووره کارگێکی گەرمێنی و خڕه لە زەوی هەڵدەتۆقێ، دومەلان، کدادک، کدارک.

**دومبەڵەک:** دمبەک، هی منداڵان. دوودەک.

**دومبل:** ناوی چەند تێلێکی کوردانە کە لە سەردەمی کۆندا لە کوردستانێکیدا لەژێر دەستی ئێرانی دابوون، دوایە چوونە کوردستانی بندەستی تورکان و لە ڕۆژئاوای شاری دیاربەکرێ دامەزراوون. فەرمانڕەواییکیان پێکهێناوه پایتەختی وان ( پالو ـ پەهلو ) بووە، کە پاشماوەی پەهلەوون.

**دومدووک:** دندوک.

**دومل:** بڕوانە: دمبل ودنبل.

**دومو** (باک.): فێڵباز، ساختەچی، کۆسە. چیرۆکێکیشە لەناو کرمانجاندا بەناوی ـ سێ موو وکۆسەبوون، ناوبانگیان هەیە.

**دون** (ئەردە.): چیچکان، چۆک، چۆکان.

**دوند:** (باک.) منداڵی نیرینه، کوڕ، لاو. بارام بێ ـ مایه واته منداڵی نێرینەی نیه. (موک.) سوند. چووار سووچەکانی لای درێژەکەی جگییە. (موک.) نووچکە، لووتکەی کێوان.

**دوندار:** سالار، سەردار، پێشەنگ. پێشکەوتوو. لەپێش بەیداخی شاریدا کەوا ئەسپی ئەئاخێوێ لەپێش تیپی سوپاسالار و هەم پێشەنگ و دونداره.

**دوندان** (باک.): تیره، نەتەوه.

**دونده:** لووتی هەوجاره، کە گاسنی تێدەخرێ. لووتکەی چیایان.

**دوندووک:** دندوک، دمک.

**دونگ** (هەو.): دووگ.

**دونگه:** پایە، دنگە. پەراسوو. (کە.) هەست. ـ کردن: هەستکردن، تێگەیشتن. دونگە مەڕانێ گەمەیەکە ( دایە مەمدە بە گورگی) دونگڵە مەڕێ.

**دونگڵەفسە:** کەڵەشێر و مریشکێکە، کە یەکپەڕی درێژی بەکلکەوه بێ.

**دونگڵەمەڕێ:** (هەو.) دونگەمەڕانێ، دایە مەمدە بە گورگی، جووره گەمەیەکە.

**دوه** (باد.): دووێنێ.

**دوهول** (باک.): دەهۆڵ.

**دوهۆڵکوت** (باک.): دەهۆڵکوت.

**دوهۆلۆک** (باک.): تەپڵ.

**دوهی** (باک.): دووێنێ.

**دوهێل** (باک.): سیرمە.

**دوهێنی** (باک.): دووێنێ.

**دوو** (باک.، بار.): دووکەڵ، تەنی. (ژەن.، بۆتا.) کلک، دوم، دوچکە، جوجکە.(هەورا.) دژ. (فە.، زەن.) دووگ، (باک.) دووف. مەیدان، شوێن، دووا، پێ وشوێن: بە ـ ی ویدا بچۆ: بەشوێن ویدا بڕۆ. لە ـ دان: مەیدان دان، بەدەمەوەدان. وە ـ کەوتن: بەشوێندا چوون بە دوودا گەڕان بەپێ و شوێنەوەچوون. ڕەدووکەوتن: وەدووکەوتنی ئافرەتە، بەشوێن نێرینەیەکیدا بەبێ مارەیی و ئاگاداری کەس وکاری.

**دوو** (باک.): ددۆ، ( هەورا.) دووێ، دوون. ژمارەیەکە لەنێوانی یەک وسێ دایە (٢). (باک.) کلک.

**دووا:** پاش، ئەنجام: ـ ڕۆژت لە بیربێ. دووایە، پشت، پەی سەر، دووادانه.

**دووائاژۆ:** ئەو کەسەیە لە دووای مێگەلییە. کێشکچی دووای لەشکری.

**دووابەدووا:** یەک لەدووای یەک؛ هەموو کارەکانم ـ ی یەکتری ڕاپەڕاند، واتە یەک لەدووای یەک.

**دووابەر:** پاشبەر، پاشەڕۆک.

**دووابەگ:** جێ نشین.

**دووابەند:** پاشبەند.

**دووابڕان:** کۆتایی هاتن، بڕانەوه.

**دووابڕاو:** دووابڕای، مەبەس لە چتێکە، کە حەزی لێ نەکەی ونەتەوێ ناوی ببەی؛ تەشقەڵەی ئەو ـ انە هەر نەبڕاوەتەوە.

**دووابڕپاگ** (ئەردە.): دووابڕاو، دووبڕپاگ، کلک بڕاو. لەناوبراو، تەفروتوونا بوو.

**دووابڕینەوه:** تەفروتوونا کردن.

**دووابین:** پاش بین، پاشەڕۆژبین. لە ئاکارو ڕووداوانی پاشەڕۆژیدا ئاگادار و شارەزا. ـ ی: پاش بینی، پاشەڕۆژبینی. ئاگاداری و شارەزایی ئاکار و ڕووداوانی پاشەڕۆژی بوون. دووربین.

**دووابینین:** دووابین.

**دووابارێز:** پاشپارێز. ـ ی: پاشپارێزی.

**دوواتر:** پاشتر. ـ ین: پاشترین.

**دوواجار:** لە دووایدا، لە پاشان، لە وەدووا، لەمەوپاش.

**دوواجەنگ:** پاشداری جەنگ، پسقەرەووڵ.

**دوواجۆر:** دووادووایی هەموو چتێک.

**دوواخران:** پاشخران.

**دوواخستن:** وەپاش خستن، پاشقەبرن، وەدوواخستن، وەخراندن.

**دووادەنگ:** قرتە بڕی، دەنگی هەرە دووایی.

**دووادۆر:** دووایی هاتن.

**دووادۆڵ:** دووایی هاتن. دۆڵەدان.

**دووادوایی:** کۆتایی و بنەبانی هەمووچتێک.

**دووارد** (هەورا.): مقەست، زلیپندک، مەگریجەنی.

**دووارگ:** مەگریجەنی.

**دوواردی** (هەورا.): مقەست، مەجریکەنی، زلیپندک.

**دوواردی تەنەکان:** مقەستی تەنەکە بڕینێ.

**دووارۆ:** یارمەتی دەر، شووێنگەر، دووارۆژ.

**دووارۆژ:** دووارۆ، پاشەڕۆژ، دەماپاشین.

**دووارۆژبین:** پاش بین، چەگناس. ـ ی: چەگناسی.

**دووازده:** (هەورا.) دووانزه، دووانزده، (باک.) دازده.

**دووازدەهەم:** دووانزه هەم.

**دووازدەمین:** دووانزەمین.

**دووازدەھەمین:** دووانزەھەمین.

**دووازۆ:** دوواتاژۆ، یاریکاری شوان.

**دووسک** (بار.): قولینچکی چاوییە ھی لای گوێیان.

**دوواکەوتن:** پاش کەوتن.

**دوواکەوتوو:** دوواکەوتە، پاشکەوتوو.

**دوواگیان:** سەرە مەرگ، گیانەڵڵا، ئاوزینک.

**دوواکەوتە:** دوواکەوتوو.

**دوواگین** (ئەردە.): دووایین، ھەرەدوواییی، قیرە، دووامین.

**دووالّ** (ئەردە.): سیرمە، تەسمە.

**دووالّە** (ھەورا.): سیرمە.

**دووان:** (باک.) پێوەر، پەیڤین، ببر، ئاخۆتن، ئاخەفتن، ئاخافتن، گفت و گۆکردن، بدوێ: باخڤە، بپەیڤە. دوودانە، دوویان.

**دووانە:** دووگیان لەبەرن، کە بە زگێکی لە دایک بووبن، جمک، لفانە، شەنگڵە بەرەکەتە، جیێوک، جێمک، جێوک، (دەر.، شا.) جووتلانە، (کۆ.) جوگمەلانە، ھەڤالجو، (ھەو.) جمکە، جمک، جمکانە، (رۆژ.) جووێک، جمژگە، ئاوزە، (دەر.) جوملانە، (باک.) جۆتزگ، جێوی، (ئەردە.) جفت، لفەدووانە.

**دووانەر:** ئاخفنەر. ـــ ی: ئاخفنەری.

**دوواندن:** ئاخڤاندن، ئاخاوتن، گفتگۆ لەگەڵ کەسێکی کردن.

**دووانزە** (ھەورا.): دووازدە.

**دووانزەھەم:** دووازدەھەم، دووانزەمین. ـــ ین: دووازدەمین.

**دووانزدە:** دووازدە.

**دووانزدەمین:** دووازدەمین.

**دووانگایی** (رەوا.): دوواییی گاران، بەرانبەری سەرانگایی.

**دووانگە:** شوێنێکە دووانەر لەسەری بدووێ.

**دووانن:** دوواندن.

**دووانـدن:** (ئـەردە.) دووانـن، ووتـووتـانن، سەرەسـەرنیان، وە ئاخـەفتن خستن.

**دووانزە:** دووازدە.

**دووانزدە:** دووازدە.

**دووانیوەرۆ:** پاش نیوەرۆ، (باک.) پاشنیڤرۆ.

**دووئاوان:** زەریب، جێگایەکە دوو ئاوی تێدا وێک کەوێتەوە.

**دوواوە:** کووین، پشتەوە.

**دوواوەدان:** گێڕانەوە و ناردنەوەی چتێک. گەڕانەوە دوواوە، دوواکەوتن.

**دوواوەرۆیین:** بەدوواوەڕۆیین، پاشەوپاش کشانەوە.

**دوواوەکەفتگ** (ئەردە.): جێگەماک، دوواکەوتوو، پاشکەوتوو.

**دوواوەکەفتن:** دوواوەکەوتن.

**دوواوەکەوتن:** کەوتنەدوواوە، جێگەمان.

**دوواوەنیشتن:** دوواوەڕۆیین، شکان، شکیان.

**دووئاوکەوتن:** نەخۆشکەوتنی یەکێکە بە ھۆی ئاوگۆڕی، کە تازە چووبێتە جێگایەکی تازە و ئاوەکەی ڕێی پێ نەکەوێ.

**دووئاوکردن:** بڕینی ئاو خوواردنەوە لە گیان لەبەر یا لە شیناوەردێکی.

**دووھێنان:** کۆتاییی پێدان، تەواوکردن، بڕینەوە.

**دووای** (ھەورا.): دووان.

**دوواییە:** لەپاشـان، پاشـان، لەدووایـە، ئیـتـر، ئیـدی، پاشـی، دپشـتـوو، دپشتڤە.

**دوواییەک:** ھی ھەرەدوواییی، ھەموو، گشتی، تێکڕا. ـــ یان ڕۆیشت: ھەموویان ڕۆیشتن. دووادانە.

**دوواییی:** ـــ پێدان: کۆتـاییی پێـدان، بڕینـەوە، بردنـە سـەر، براندنـەوە. سـەرەنجام، پایـان، ئـەنجام، کۆتـاییی، دوواجـار، لەپاشـان، پاشـین، پاشینی، بنەبان، دومـاییی، دومـاھک، دومـاھکی، پاومـان. بێ ـــ : بێ دوندان، بێ منداڵ، بێ شووێن، بێ پایان، پایک.

**دوواییی پێھێنان:** کۆتاییی پێھێنان، براندنەوە.

**دووایین** (ئەردە.): دوواترینی چت.

**دوواییی ھاتن:** برانەوە، دوواڕۆژ، کۆتاییی ھاتن، دووادوّڵ، تەواوبوون.

**دوواییی ھێنـان:** پایـان پـێ دان، قوتکـرن، قـەداندن، بڕینـەوەی چتێـک، کۆتاییی پێدان، تەواوبوون.

**دووئەلۆ** (باک.): شەڕی تەن بەتەن.

**دووە** (ھـەورا.): ھەڵمێکـە لـە کـەناری ئاسمـانێدا پـەیدا دەبـێ لەبەرگەرمایە.

**دووەبراڵە** (ھەورا.): جووتکەی برادەران، ئەستێرە.

**دووەجارە** (ھەورا.): دووجاران.

**دووەرژن** (ھەورا.): قورمی خانوو.

**دووەک** (ھەورا.): دژک.

**دووەگیان** (ھەورا.): دووگیان، ئاووس.

**دووەم:** دووھەم، چتێکە لـە پلـەی دووەم دابێ. ـــ ی: دووھـەمی. ـــ ین: دووھەمین، ئەوی ھەرەدووەم.

**دۆب:** ڕاکە، غاردە، ھەڵێ.*

**دووباد:** دوولۆ، ڕیسی دوولۆ، پتەو، قایم، مەحکەم، دووبـەر. ڕێسـراوێکە دوولۆ کرابێ و با درابێ پێکەوە. مرۆی قەڵەو و تێکسرماو و داڕێژراو.

**دووبـارە:** دووپاتـە، دیسـان، دیسـا، ھەمیسـا، ھەمیسـان، نـووژەن، لـە نـووژەن، لـەنووێوە، بـۆ جاری دووەم، ھەمیسانەوە. ئارەقی ـــ : ئـارەقی پـاڵێوراو. چتێکـی گـرد و کلـۆر لـە دار یـا لـە قـوڕ یـا لـە قـامیش دروستدەکرێت بە پاشەوانەی ھەنگەوە دەنرێت تا شانەی ھـەنگوینی تێدا دروستکات. دووبەرە. ـــ بێژیاگ: دووبارە تەقیاگ، دووبارە دابێژراو. ـــ کردنەوە: دووپاتە کردنەوە. ـــ پات: ووتە یا کردەوەیەکە دوو جاران کرابێ یا ووترابێ.

**دووباڵکە** (رەوا.): دووابان، بانی سەردیوارانە، لـە دێھاتـانی کوردستـانی کوردستانێدا سەر دیواری وەکوو بانی پان دەکەن و زستانانیش دەیگێڕن.

**دووبە** (جەبا.): ھـەنگوینی پـاڵێوراو و چۆڕاوەوە، ڕەواقی ھـەنگوینی. (کە.) بەرمیل، نیرە، کووپەی گەورە لە دار و یا لە ھەر چتێکی تر بێ.

**دووبەختی:** خۆ و بەخت، لە گوماندا، ئەنجام نادیار.

**دووبـەدوو:** پێکـەوە، بەیەکـەوە، جووتـە، دووکـەس پێکـەوە. بێدەنـگ، لەسەرەخۆ.

**دووبەر:** دوویاد، پتەو، قایم، مەحکەم.

**دووبەرە:** دووبارە، چتێکی گردی کولۆرە لە دار یا لە قوڕ دروست دەکرێ لە پاشەوانەی هەنگییەوە دادەنێن تا شانەی تێدا هەڵبەستێ.

**دووبەرەکی:** دوو تیرەیی، بەربەرەکانێتی و مل ملانێ، ملەملە ڕاوەستانی دوو یا چەند کەسێک لەگەڵ یەکتری. ناکۆکی، دووبەندی.

**دووبەرخ:** مەڕێکە دووجاران زابێ.

**دووبەرداری** (هەر.): جووانووێکە چووار بەهاری دیتبێ.

**دووبەندی** (باک.): دووبەرەکی، ناکۆکی.

**دووبەهەمدان** (ئەردە.): شۆفاری، زمان لێدان.

**دووبڕ:** جووانووە ئەسپێکی دووساڵانەیە، کە هێشتا زین نەکرابێ سوواری نەدابێ.

**دووبرا** (هەورا.، شا.، هەڵ.): کرکاڵە، دووبراک، باڵندەیەکی ڕاوکەرە وەک هەڵۆ وایە هەمیشە دوو دوو پێکەوە دەفڕن، باڵندەیێکە هێندەی سیسارکە کەچەڵەیە فیتووی لێ دەدا، کیسەڵی لە حەواوە بەر دەداتەوە سەر ڕەقانی و دەیکووژێ، لە لای هەندێکان هەڵۆیە.

**دووبراک** (باک.): دووبرا.

**دووبراڵە:** دووبرا.

**دووبرە:** بەردی دووبرە، مەرمەڕی خاو. جوورە خشڵێکی ئافرەتانە ژنان لەسەری خۆیانی دەدەن.

**دووبرپاگ** (ئەردە.): دووابڕاو، دووابڕیاگ.

**دووبقەیە:** ناونووسی بۆ پێتاک.

**دووپ** (باد.): ڕەواقی هەنگوین و شیریناتییە.

**دووپات:** دووبارە، دووجار.*

**دووپاتە:** دووبارە. ــ کردنەوە: دووبارەکردنەوە.

**دووپاتە کریاگ:** دووپاتە کراو.

**دووپاپیلە** (ئەردە.): دووپاپیلکە، دووپا.

**دووپاپیلکە:** داعبایەکی کێوییە لە سمۆرە گچکەترە لە مشک گەورەترە.

**دووپەڕە:** گیایەکی بەهارییە وەک سێپەڕە، بەڵام ئەم پەڕەکانی دوو دوون.

**دووپەڕوو:** بشکی مەشکە.

**دووپەلان** (ئەردە.): چتی دوو فلیچقانە، دوولکان، دوولک، دووفلیقانە، دوولەپان.

**دووپەلە:** قنگاوڵە. سەوز بوون و ڕووانی گیاو دارە، کە تازە سەری لە خاک هێنابێتە دەرێ و پەلی دەرکردبێ. ــ بوون: ڕووانی هەندێ سەوزایی و پەل دەرکردنی.

**دووپەللە** (هەو.): قنگاوڵە.

**دووپشتەکی:** هاوپشتی.

**دووپشک:** داعبایەکی چنگ چنگی کلک گرێ گرێی چزووداری بە گیاندارانەوە دەدا. کولاژدم، (باک.) دووفیشک، (گۆ.) کەلاشدوم، (کۆ.) دومارەکۆڵ، (ئەردە.، هەورا.، فە.) دمارەکۆڵ، (هەورا.) مارەکۆڵ، (جا.) چزەپیلە، کەژدم، دمالەکۆڵ، دووپشت، مێملی مرۆڤان و مارییە.

**دووپشکانێ** (هەو.): جوورە گەمەیەکی کوڕانە.

**دووپشکە:** بەو گۆیانە دەڵێن، کە بە دەسکی خەنجەرانەوەن و لە زێڕ یا لە زێو دروستکراون.

**دووپلێ** (ئەردە.): چتێکە ڕەنگی پلپل بێ. دووڕوو، دووزووان، دووڕاز. (ئەردە.) ــ ی: دووڕوویی، دووزمانی، دووڕازی.

**دووپۆشە** (ئەردە.): دوونهۆم، دووتەبەقە.

**دووپێک** (بەخ.): تاقیمانە. ــ کردن: تاقی کردنەوە.

**دووپێ یی:** جوورە هەڵپەڕینێکە.

**دووتا** (باک.): بەهێز، بەگوڕ لە کار و باردا، دوولنگەبار. لاواز و بێ تین کار. ــ یی: دوولایی، بەهێزی. جەواڵ یا هۆڕ یا تێرێکە، کە هەردووک تایە (لنگە) کانی پێکەوەبن.

**دووتس** (باک.): بە هێز (بۆ وولاخ).

**دووچار:** تووش، پێوە، گرفتار، تووشیار، ئادقە. ــ بوون: تووش و گرفتاربوون، پێوەبوون. ــ کردن: پێوەکردن، گرفتارکردن. ــ بوون: گەیشتنە یەکتری. ــ ی: گرفتاری.

دووچەرخە

**دووچەرخە:** ئەسپە ئاسنینە، پایسکل. عەرەبانەی خاک و خۆڵ و زبڵ پێ فڕێدانێ.

**دووچەرخەی دەسی:** عەرەبانەی دەستی، گەردوونەی دەستی.

**دووچەنان:** دووچەندان، دووچەندانە.

**دووچەنانە:** دووچەندانە.

**دووچەندان:** دووهەند، دووهێند.

**دووچەندانە:** دووچەنانە، دووهێندە، نەتەوەی کورد دوو ئەوەندەی نەتەوەکانی تر زیرەک و ئازایە.

**دووچەنگ:** بە دەنگێکی دەڵێن، کە بە دووبڕگان دەردەبڕێ: وەکوو: دەر-مان، تا-وان.

**دووحاچە** (ئەردە.): دووپەلان، دوولک.

**دووخ:** ڕاست، چتی ڕاست، دوویخ. جاڵەت. دووک، مرازێکە لە کەرستەی خەرەکی دەزووی پێدەڕێسرێ، کلکی خەرەکییە ڕێسراوەکەی لەسەر هەڵدەکرێ و ڕاستە.

**دووخاڵ:** نیشانەیێکە وەکوو (:) لە پێش ووشە یا ڕستەیەک دادەنرێ کە مەبەسی ڕاستەقینەی بە دووادابێت.

**دووخان** (باک.): دوو، دووکەڵ.

**دووخەت:** لەنێو پلەدارانی سوپایی و دارۆغاندا ئەو کەسەیە، کە دوو خەتی لەسەر قۆڵی دروابێ.

**دووخشتەکی:** ئاکە هەڵبەستێکە.

**دووخەوبوون:** بێدارێکی زۆرە لە نێوانی دووچین نوستناندا.

**دووخەوی:** دووخەوبوون.

**دووخۆر** (زەن.): چەقەڵ.

**دووخوز** (کە.): دەخەز، نەخۆشییێکە ڕەنگ زەرد دەکات.

**دووخوزدار:** دەخەزدار، دەردەدار.

**دووخێن:** دۆخین، دووخین.

**دووود:** دووکەڵ، کادو، قانگ.

**دوودانه:** دوو انه.

**دوودانگ** (ئەردە.): شلّێوە. بەشی پاش، پشک، خانوو و سامان بە بڕیاری کوردان، شەش ــ ە: واتە دووبەش لەشەش بەشان. دانەوێڵەیەکە دەنکەکانی دوو جۆربێ واتە هاڕاو و درشتی تێکەڵاو بێ.

**دووده:** (بابا.) ڕەژەن، فیر، سەفیر، (باد.، ڕەوا.) تەنی، تەن، هیس، دوورنج، دوودی، دووکەڵ، دووکەڵی چراو ئاگرییە، کە بە چتێکەوە بنووسێ.

**دوودەری:** پەنجەرەی دوو دەرک لە نێوەڕاستیدا بکرێتەوە، دووتایی، بۆ دەرکەی دوولاییش بەکاردەبرێ.

**دوودەست بەتاڵ:** مەبەس لە کەسێکییە بە کڕین و فرۆشتنی چتی پڕو پووچ دەستمایەیەکی باش پێکەوە بنێ و دەست بکات بە کڕین و فرۆشتنی چتی گەورەتر.

**دوودەسماڵــە** (ئــەردە.): هەڵپــەڕین، هەڵپــەڕکێ، چۆپــی دوو دوو بەدوودەسڕان. جوورە هەڵپەڕینێکە دوودەستە سڕی تێدا هەڵدەسووڕێنن.

**دوودەک** (باد.): شمشاڵ. تووتەک و باڵەبان، دمبەک، دمبەڵەک. (باک.) فیتە، دوودک. ــ لێدان: فیتەلێدان. (باک.، باد.) بلوێری قامیشییە، کە پیکی دووزەلەیە.

**دوودەم:** (هەو.) دوودەو. تەوور.

**دوودەمــان:** خێــل و بنەماڵــەی خانــەدان و گــەورە، کــەس و کــار، هــۆز، خانەدان، خزمان.

**دوودەو:** دوودەم، قەڵەمبڕ. دوودەم: تەوور.

**دوودەکەرە:** جوورە گۆزروانێکە، بەڵام ئەم ناخورێ.

**دوودڵی:** نیگەران، (باک.) باوەڕگومان، بێ ئیپ و زیپ، دووگومان، ڕاڕا. ــ بوون: دامان، نیگەران بوون.

**دوودڵی:** نیگەرانی، داماوی، باوەڕگومانی، ڕاڕایی.

**دوودووکەرە:** جوورێکە لەگیای گۆزروان ناخورێ.

**دوودی** (ئەردە.): دوودە.

**دوور:** دووێر، دیر، واژی نێزیکە. ــ بوون: دوورکەوتنەوە. ــ خستنەوە: چەپاڵــەدان، دەرانــدن، شــەلپاندن. ــ لــە ڕووی تــۆ: دوولــە ڕووی تــۆ، پەرژینی قایم بێ لەکاتی دەربڕینی دووانێکی بێ شێوازدا بەکاردەبرێ. ــ ی تە: خووا بتپارێزێ، دوورلەتۆ. خۆ ــ خستنەوە: خووەدان، ئالیکێ. جودا، جووایەز، جیاواز، جیا.

**دووراز** (ئەردە.): دووڕوو، دووزمان.

**دووراڤێژ:** دووراوێژ.

**دووراقە:** بڕوانە: دوراقە.

**دووران:** دروان.

**دوورانــدن:** دروون.

**دوورانـدوور:** لەدوورەوە.

**دووراێن:** دروون، درونەوەی دەغڵ و گیا و ئیتر.

**دووراننەوە:** دروونەوەی کەل و پەل و چتی دڕاو و ئیتر.

**دووراو:** دڕاو.

**دووراودوور:** لە دوورەوە.

**دووراوێژ:** لە دوورەوە هاوێژتنی چت.

**دوورایی** (باک.): دووری، ماوە.

**دوورەبەرد:** هاوێژتنی بەرد لە دوورەوە: ئەمڕۆ دارا بە ــ مارێکی کوژت.

**دوورەپارێز:** دوورەپەرێز.

**دوورەپــەرێز:** ســڵ کردنــەوە و هاتنەپێشــەوەی یــەکێک لــە یــەکێک بــە پارێزەوە.

**دوورەدەس:** دوورەدەست.

**دوورەدەست:** دوورەدەس.

**دوورەژەن:** دوورێــژان، بــەوە دەڵێــن لــە کــاتێکیدا، کــە گوێلــەگ نەگاتە دێلــەگی لە دوورەوە لێی بژەنی.

دوورەژنەو

**دوورەژنەو:** تەلەفۆن، دوورەدەنگ، دووردێر، دووروێژ، دووربێژ، دوورگۆ.

**دوورەگ:** دوڕڕە، سەگێکە لــەنێوانی ســەگ و تــاجیدا پــەیدا دەبــێ و بــۆ هەموو گیان لەبەرێکی دەبێ، کە لە دوو جسنان بێ. ــ ی: دوڕڕەیی.

**دوورەنـدێش:** کەسێکە زۆر بیر لە ئەنجامی چت بکاتەوە، دووربین. ــ ی: بیر لە ئەنجامی چت کردنەوە، دووربینی.

**دوورەنـگ:** دووڕوو. بەڵەک، بازی، بازگ، پلپلی. ــ ی: بەڵەکی، بازگی. دوڕوویی.

**دوورەوەکەفتن:** دوورکەوتنەوە.

**دوورەوپەرێز:** دوورەپەرێز.

**دوورەوکەفتن:** دوورکەوتنەوە. ئاوارەیی، دەربەدەری.

**دوورەوکەوتن:** دوورکەوتنەوە.

**دووربا:** خوانەکا، خووای نەخوواستە.

**دووربەدوور:** دووراودوور.

**دووربوون:** دوورکەوتنەوە.

**دووربێ:** دوورلە، دوللە، دووربا، خوانەکا، خودای نەخوواستە.

**دووربین:** مرازێکە، کە بــەوێدا تەماشای شووێنانی دوور بکــرێ نزیــک دەبنــەوە، دوورنــووار. دوورەندێــش، دوورنووار، (هەورا.) دووروبین، کەسێکە دوور بڕوانێ و تەماشای ئــەنجامی کــاران بکــات، تــێ بــین، (بــاد.) هزرتیژ. ــ ی: لە ئــەنجام و کۆتایی کار و بار و هەموو چتێکی ووردبوونەوە، کووربینی، هزرتیژی، یەدەگ، دوورەندێشی.

دووربین

**دوورخستن:** خستنەلاوە، دوورکردنەوە، دوورکرن.

**دوورخستنەوە:** چت بۆ مەبەسێک بۆ دوور ڕادان.

**دووردەس:** دووردەست. ــ ی: دووردەستی.

**دووردەست:** دووردەس، چتێکە هێنــدە دووربــێ دەســتی نــەگاتێ. ــ ی: دووردەسی.

**دووردەنگ:** دوورەدەنگ، تەلەفۆن.

**دووردووک و باڵەبان:** مۆزیقە و باڵەبان، شایلۆغان.

**دوورک** (باد.): لەواشە، شمشێرەی دەرگایە، گوڵە.

**دوورکەوتنەوە:** تەوانگ دەران، شەلپین، جووێ بوونەوە.

**دوورکردن:** دوورکرن.

**دووركوژ:** چت یا كەسێكە لە دوورەوە جوان و لە نزیكەوە ناشیرین بێ.

**دورگە:** بە پارچە زەوی یا ولاتێک دەڵێن چوار دەوری ئاوبێ.

**دوورگرتن:** دووری کردن.

**دوور لەتۆ:** دوللەتۆ، لە تۆ بەدوور بێ.

**دوورنج:** دوورژنگ.*

**دوورنووار:** دووربین. ــ ی: دووربینی.

**دوورڤا** (ئەردە.): دووربێ، دوورڤانێ، لەو بەرووبۆیە بە دووربێ، خوا نەخوا استە.

**دووڕوو:** دوو پـــێل، دووزوان، دووزمـــان، (هــەورا.) دووەزمـــان، دووڕژ، كەسێكە بەرەوڕوو جوورێک و لە پاشملەش جوورێكی تر بێ.

**دووروونزیک:** دوورونیێزیک. بەمـــەزندە، بەتـــەخمین. بــۆ شــووێنکەوتنی گیانلەبەرێكی بەكار دەبرێ بە جوورێكی وا، كە نە دوور و نەنزیک بێ، ــ بە شووێنی فیسارەكەسدا ڕۆیشت.

**دووڕوویی:** بەرەوڕوو بە جوورێک ئاخۆتن و لە پاشملەش بە چەشنێكی تر، دوپلی.

**دوورویین** (هەورا.): دووربین.

**دوورێتی:** دووری، دووراهی.

**دووڕێزان** (باک.): هەڵبەست.

**دووڕێژان:** دوورەژەن.

**دوو ڕێ یان:** شووێنێكە دوو ڕێگای لێ بێتەوە، دووڕیان، سەرگەی دوو ڕێ یان.

**دووری:** پاكی، بێ پەڵەیی. ڕەو، ڕەم، پاشەكشە. دووراهی، دوورایی، جیایی. ــ كردن: خۆكێشانەوە، كشانەوە، خۆپارازتن، تەكینەوە، خۆدزینەوە، خۆدوورخستنەوە، ڕەوین، ڕەوكردن، هەڵاتن، تێ تەقاندن، تەنراوێكی تەنكی كونكونە ئافرەتان بەسەریانی دادەن. گتوڕ، گیایەكی كوێستانییە دەكرێت بەگزرە بۆ ئاژاڵان.

**دووریاگ** (ئەردە.): درواو، درواوەوە.

**دوورین** (باد.): درووێنە. دروون.

**دوورینەوە:** دروونەوە.

**دووڕێویلە:** گیایەكە دوولقی لێ دەبێتەوە سەربەرەو ژوورو وە كلكی ڕێوی دەچی.

**دووز** (باد.): بووزوو.

**دووزاخەدان:** سەخڵەت كردن و لەگیرخستنی یەكێک.

**دووزام:** گــول، (بــاک.) بەلوەشــین، كەسێكە تووشی نەخۆشی گـــولی و دووزامی و پیسكەیی بووبێ. ــ ی: گولی، پیسكەیی.

**دووزان** (باک.): گوێزان.

**دووزەخەكی** (ئەردە.): دووڕوویی، دووزمانی، دووزوانی.

**دووزەردێنە:** هێلكەیەكە دوو زەردێنەی هەبێ.

**دووزەخ:** دۆژە.

**دووزەلە:** دوودک، دوو قەفە قامیش پێكەوە دەنووسێنرێن بەقیل و پیكیان لەسەری گیراوە و هەریەكەی چەند كونێكیان تێدایە كە فــووی تێكـەن دەنگی لێوەدێ.

**دووزك** (باک.): گیایەكە.

**دووزمان:** پێكولچێن، تەلاقرەش، ئاوری بنكایە، گـای بنـە، دۆخمـان، دووڕوو. ــ ی: بەیی، دۆخمانی، پێكوڵچاندن، پونگ كردن، ئاپتەری، (گەر.) هێڵە، هەڤانی، لەناڵ و بزماردان، بۆلێدان، گۆیــەن، گۆیــەند، تێچاندن، دووڕوویی.

**دووزمانی كردن:** زمان لێدان.

**دووزووان** (هەورا.): دووزمان. ــ ی: دووزمانی.

**دووژ** (باک.): دۆژە، جەهەنەم.

**دووژە** (باک.، بۆتا.): جەهەننەم.

**دووژەنگ:** چینی برۆ و نێوچاوانە. گوژەنگ، دۆرنج، قرم.

**دووژمان** (هەورا.): جنێو.

**دووژمن:** (باک.) تومسی، (خۆ.) تاسب، (موک.) نەتەوی، خەنیم، نەیار، ناحەز، قـانـدڕ. ــ ایەتی: نـەیارێتی، ناحـەزی، دژمنـاهی. ــ ی: نەیاری، ناحەزی.

**دووژنە:** پیاوێكە دوو ژنی هەبێ.

**دووس:** دۆست.

**دووساخ** (هەورا.): بەندی، دیل، گیراو. (هەورا.) ــ خانە: بەندیخانە.

**دووسەر:** دووفلیقانە، خاوەندی دووسەران. ــ ی: هێلكەیی، وەكوو شكڵی هێلكەی.

**دووسەرە:** بروانـە: دووگونـە. خـاوەندی دووسـەران، تۆمـاركراو. (بـار.، گەر.) هەزار پێ.

**دووسبە:** دووسبەی. ــ ی: سبەتر، (هـەورا.) پێرای، پێرێ، (بـاک.) دیترارۆژی.

**دووسم:** ئەو وولاغ و ئاژاڵانەیە كەسمیان دووفاق و دووپارچەیە وەكوو بزن و مەڕ و ڕەشە وولاغ و ناسک و بەراز و ئاژاڵی كێوی.

**دووسمە:** دووسم.

**دووسوو** (ئەردە.): دووسبەی، دووسۆزی.

**دووسێ:** لە بنچینەدا(دوو یا سێ)یە بەڵان بۆئاسانی و كورتی (یا)یە كەی لێ فڕێ دراوە.

**دووسی** (ئەردە.): دۆستی، دۆستایەتی، هاوڕازی.

**دووش** (باک.): درێژایی، دـــا بازێڕی ڕا. (ئەردە.) دۆشیدەنی.

**دووشاخە** (موک.، بابا.): وەناق، (هەورا.) وەناخ، (موک.) گـەرووە خڕە، دەردێكی پیسە ئەگەر زوو چارە نەكرێ دەیخنكێنی. بیراز كردنی گاسنی كۆڵە. (ئەردە.) چتی دوولپ، دووخاچە، دارو درەختی دووپەل و دووفاق، دووفلیقان، دوولەپان. ــ كردن: پارچە ئاسنێک لەگاسنی كۆڵ كردنەوە. سەر و پۆپی تووتنی سەوز قرتاندن.

**دووشانی** (بـاک.): خـەڵات، بەخشـش، ژێردەسـتان دەیـدەن بـە ئاغـا و سەرۆكەكانیان.

**دووشەم:** دووشەمە، دووشەنب.

**دووشەمە:** دووشەمە، دووشەنبە، دووشەمبە، دووشەمۆ، دووشەمۆ.

**دووشەمب** (باد.): دووشەمە.

**دووشەمبە:** دووشەمە، دووشەوە، کورد و فارس ژمارەی ڕۆژانی هەفتە بە شەو وە ئارەوان بە ڕۆژ دەژمێرن.

**دووشەممە** (هەورا.): دووشەمە، ڕۆژی سێیەمی هەفتەیە لە هەینی بە دواوە، کەوتۆتە نێوانی یەکشەمە و سێ شەممەوە.

**دووشەمۆ:** دووشەمە.

**دووشەموو:** دووشەمە.

**دووشەوە:** مانگی دووشەوە.

**دووشەویلە:** دووشەویلکە، (کرما.) کاکیلە.

**دووشەویلکە:** هەردووک لاشەویلکەکان.

**دووشخوواردن:** کولانی شلەمەنی لەسەر ئاور.

**دووشک:** بەدگومان، نیگەران، دووگومان، دوودڵ، دوودڵە.

**دووشکە:** دووشک.

**دووشمین** (لک.): جنێو.

**دووشیاگ:** دۆشراو.

**دووشیوان:** شوێنێکە دووشیوی تێدا وێک کەوێتەوە.

**دووعووم** (کە.): مەڕێکە چارەی نەڕەش نە بۆرێکی تەواوبێ.

**دووغەدووغ** (کە.): گمەگمی کۆتری.

**دووفاق:** چتی دووپەل و دووشاخە.

**دووفلیچقانە:** چتێکە دووپەلی لێ بووبێتەوە پەلەکانی لەیەکتری نزیک بن.

**دووفلیقانە:** چتێکە سەری دوولک بێ، دوولەپان، دووشاخە، دوولپ، دوولک، دووپەلان.

**دووفیچ** (باد.): چەلاک، (زا.) هەچی، دارێکی درێژی سەر قەلانگییە بۆ ئەوە بەکاردەبرێ، کە بەری دارانی پێ لەلکە بڵندەکان بکرێتەوە.

**دووڤ** (چی.): کلک. (باک.) پشتەوە، دوو، دواوە. دووگ.

**دووڤیشک** (باک.): دووپشک.

**دووڤچک** (باک.): دووگی گچکە.

**دووڤدان** (باک.): کێشکچی دواوە.

**دووڤدرێژ** (باک.): کلک هەڵتەکێنە، جوورە باڵندەیەکە.

**دووڤرەپک** (باک.): کلک هەڵتەکێنە، باڵندەیەکی کلک ڕەپی بۆرە.

**دووڤستک** (باک.): جوورە کوللەیەکە کلکی وەکوو بەردی ڕەقە.

**دووڤسۆرک** (باک.): جوورە هەرمێیەکە، ئالیسۆر.

**دووڤک:** گوڵینگەی خورجێن، غولامی چەل ومل، کلکە، بەرماوی پاش خەرمان. جێ خەرمان ماڵ، دەستەندووی هێشە.

**دووڤکەنیاچاڤ** (باک.): نوختەی پێک گەیشتنی دەرەوەی چاو.

**دووڤکوت** (باک.): کلک بڕاو.

**دووڤلک** (ئامێ.): کلک.

**دووڤ مەساس:** جوورە باڵندەیێکە شەوانە بە چەنگی خۆی هەڵدەواسێ بە درەختانەوە و دەفیکێنێ تا خەوی لێ نەکەوێ نە وەکوو بیگرن.

**دووڤات:** دووهێندە، دووچین، دوونهۆم. دووبادا: ئەو فاسۆنە ـــ ە: دووبارە.

**دووڤەد:** دووتووێ، دوولۆ، دوولا، دووتیکە.

**دووڤەدەرە** (بل.): بڵقەدەرە.

**دووڤۆچکە** (ئەردە.): جوورە کلاوێکە لەسەر دەنرێ وەکوو کلێتە وایە.

**دووڤۆر** (باک.): بزنێکە تووکی تێکچرژابێ وەکوو خاچی، لە هێت و چوور.

**دووڤووڵری** (کە.): قوڵەبنە، تێکسرماو، قەڵەو و ناشیرین. دیزە و چتێکی وایە، کە دووهەنگڵی بێ.

**دووڤوڵفی:** دووهەنگڵ، جووتهەنگڵ.

**دووڤیمەکردن:** دوونیمە کردنی چتێک.

**دووک** (هەورا.): کەد (لق) ی ووردی دارە بەروو، کە لە قەدییەوە دەری دەکات لە بن لقەکانی. (هەورا.) دووخ، خەرەک. کلک. دۆک. (کە.، فە.) تەشی. (ئەردە.) شیرەیەکی سپییە، کە بەسەر شیناوەردییەوە دەنیشێ و ووشکی دەکات.

**دووکان:** (ڕەوا.) تکان. دکان، دوکان، ئەو ژوورانەن لە بازاڕیدا، کە کەل و پەلیان بۆ فرۆشتن تێدا دەنرێن. خانەیەکی چوار گۆشە یا درێژۆکەی بردراوە لەناو زەوی و زار و بێستاناندا بۆ ئاودان و شەتڵ تێدا چەقاندن، کە شەتڵەکان بەرز بوونەوە هەڵدەکەنرێ و لەناو دێراو و شووێنی ئامادەکراودا دەچەقێنرێ.

**دووکانە:** (خۆ.، ڕەوا.، سوو.) دەمکانە، دمکانە.

**دووکاندار:** دکاندار، دووکانچی، کسێکە لە دووکانێدا خەریکی کڕین و فرۆشتن بێ. ـــ ی: پیشەی دووکاندار.

**دووکانۆکە:** کۆل، دووکانی گچکە.

**دووکایچ** (هەو.): دووخ.

**دووکە** (کە.): شەڕی دەمەقاڵە لە نێوانی ژن و مێردیدا.

**دووکەدووک:** دووکە.

**دووکەش** (ئەردە.): دووکەڵکێش.

**دووکەک** (هەورا.): چیکەنە.

**دووکەڵ:** ژەنگار، تەم، دووکێل، کادوو، کادی، (ئەردە.) دوو، دوودی. دوومان، دومان.

**دووکەڵاوی:** ژەنگاری.

**دووکەڵە** (ئەردە.): قۆزاخە.

**دووکەڵدان:** دووکەڵکێش. قانگ دانی ڕێوییە لە کونێدا تا بێتەدەرێ و ڕاو بکرێ یا هەنگان. مەبەس لە هەلاوسینی مەشکە و کوندە و خیگە و ئیترە بە بن مێچیدا.

**دووکەڵزن** (هەورا.): قورمی خانووان.

**دووکەڵکردن:** دووکردن

**دووکەڵکێش:** کەرەنا، لوولە و بۆرییەکە دووکەڵی پێدا دەردەچێت.

**دووکەڵگیر:** دووکەڵکێش.

**دووکەڵ هەڵستاندن:** سووتاندن، بۆ مەبەسی کوژتنیش بەکاردەبرێ.

**دووکەوتن:** وەشووێن کەوتن، ڕەدووکەوتن.

**دووکەوی** (هەورا.): چیکەنە.

**دووکڵە:** تەشی، تەشیلە. داعبایەکی درێژکاری ڕەشو سووری شاخدارە وەکوو قالۆچە.

**دووكلكه:** داعبایەكی ڕەش و سووری درێژکۆڵەی شاخداره لە قاڵۆچە دەچێ کلکێکی دووفاقی هەیە.

**دووكۆیی** (ئەردە.): دووبەشی، چتی دووبەش لەناوەندی دووکسانندا.

**دووكوڕ:** جووره مراوییێکه.

**دووكولیه** (هەورا.): دووکڵه.

**دووكونه:** جووت ئەژنۆ.

**دووكووم** (دزە.): هێرش، پەلامار، داڕسکان.

**دووكێش** (باک.): دووکەڵکێش، بوخاری.

**دووكێل** (باک.): دووکەڵ.

**دووگ:** (هەو.) دوونگ، دمە، (دەر.) دووڕیمی، (زەن.) دوو، (باک.) داف، دووف. ـــ ی سەرپشتی ووشتران: کۆپانه.

**دووگسنه:** زەوییەکە دووجار کێڵرابێ، دووهێشه.

**دووگرد:** بەرماڵ، دووگورد. پێخەفێکە وەکوو جاجم بەڵام ئەم لە لۆکە دەڕێسرێ. ـــ ی: جاجم و مەوجی پێ لێ وەرگێڕ.

**دووگلەنگی** (کە.): مەڕێکە دووپارچە گۆشتی خڕسکی بە ملەوە بێت

**دووگمە:** پشکۆک، پوولاک، (باک.) بشکۆف، پرزانگ، (هەورا.) کانالی، لەپکە، بشکۆک، بشکۆژ، بشکۆفت، بشکووژ، (هەورا.) قولۆفچی، (بار.) قولپک.

**دووگمەودوڵاب:** جووره خشڵێکە لە سیخمە دەخرێ هەردووک لای دۆلابەکەی سێ قاشی زێڕە و بە بەردی نرخدار نەخشاوە، داوێنی سیخمەی پێ قایم دەکرێ.

**دووگمەی قەیتان:** بەرکۆژە.

**دووگور** (زا.): دووگوردی.

**دووگورد** (هەو.): بەرماڵ، دووگردی.

**دووگوردان** (باک.): خورج، خورجێن.

**دووگووردی** (کە.): تێکسرماو، قولەبنە، بەژن کورت، کورتەبالا. دووگردی.

**دووگورژه** (ڕۆژ.): پیله، دەمەقاڵە. ـ کردن: پیلەکردن.

**دووگومان:** دوودڵ، نیگەران. ـــ ی: دوودڵی، نیگەرانی.

**دووگونه:** دووگونەڕەشه، گیایەکە لە دەخلی دەشالێ یا بەزەویدا پان دەبێتەوە، گەڵای شین و وورده، لاسکی و گەڵایەکانی بە بەرگی مرۆڤانەوە دەنووسێ، چونگوگرە وەک مشاری تۆوێکی تاڵی گچکەی شەنکۆڵە لەناو خەڵەیدا دەبێ تاڵه، تاڵوو، گلێره. ـــ ڕەشه: دووگونه.

**دووگوه:** دارێکی دووگوویێیە دڕکی پێ دەشکێنرێتەوە و جێ گۆڕی پێدەکرێ.

**دووگووێ:** (موک.) هاچە، کۆڵەکەی دووفلیقانەیه.

**دووگێ** (کۆ.): دووگووێ، کۆڵەکەی دووفلیقانەیه، (موک.) هاچه.

**دووگیان:** ئاووس، تۆلپڕ، زگپڕ. ـــ ی: ئاووسی.

**دوول** (باک.): دۆڵ.

**دوولا:** دوولۆنه، دوولۆ، دوولاره، بەنێکە دوو لۆ با بدرێت.

**دوولاب** (فە.): دۆڵابی قاپ و قاچاخان.

**دوولازەن:** دووڕوو.

**دوولانه:** دووقەد.

**دوولانەکردن:** دووقەدکردن.

**دوولایی:** کردەوەی دوولایی.

**دوولایی:** مرازێکی ئاسنینی سەر قوڵفداره ئالقەڕێزی بەسەر دادەکرێ و لەسەر ویشەوە قفڵ دەدرێ.

**دوولەپان:** چتی دوو پەل، دووفلیقانه.

**دوولەپانی کۆمی:** ناوچەی کۆمی، ناوچەی قوون.

**دوولەپشت** (باک.): دوولەپشک.

**دوولەقان** (ئەردە.): چتی دووپەل، دوولەپان.

**دوولپ** (کۆ.): دووفلیقانه، دوولک.

**دووڵقەدەره** (کە.): مارخۆر، قۆڕی، داعبایەکە لە ڕەگەزی قومقومۆکییە بەڵان گەورەترە و ڕەنگی زەردە.

**دوولک:** دوولکە، دوولپ، دووفلیقانە، دارێکی سەر دووفلیقانەیە چاڵووکی پێ هەڵدەکەنن. (باک.) چۆمی چکۆڵە.

**دوولکه** (موک.): گیایەکە هێندەی گەفی بڵند دەبێ، گوڵی سپییێکی دوولکە و شۆڕدەبێتەوە و تۆوەکەی، کە سپی بکرێ باریک و درێژه. (هەو.) بە مردووان هەڵکوتن.

**دوولکەبێژ:** ئەو کەسەیە بە مردووان هەڵبڵێ، سەردوولکە. ـــ ی: بەمردووان هەڵکوتن.

**دووله:** دوورلە.

**دوولەڕووی تۆ:** دوور لەڕووی تۆ، لە تۆ بە دووربێ.

**دوولۆ:** دوولا، دوولانه.

**دوولۆره:** کەسێکە بەسەر زگ و سینگیدا کەوتبێ و درێژ بووبێ، تلۆر، دەمەوڕوو، لەپەوڕوو.

**دوولۆنه:** دوولۆ، دوولا.

**دوولۆیی:** دوولایی.

**دووما** (لوڕ.): دووا، پاش

**دوومارەکوڵ** (کف.): دووپشک.

**دوومالەکی:** ماڵ جووێ کردنەوه لەگەڵ یەکێکی.

**دوومان:** تەپ و تومان.

**دووماهک** (باک.): ڕشته، دووا، پاش. (باک.) ـــ ی: دووایی، پاشی.

**دوومەشقان:** لەسەر چۆک دانیشتن.

**دوومەڵ:** دومەڵ، قوونێر.

**دوومەلان:** دومبەلان.

**دوومەلەک:** دمەک، دنبەک. *

**دوومرەکی:** ڕاسان بە چەپ و ڕاستدا بۆ لێدان. *

**دووشک** (شا.): دووپشک.

**دوو:** ئەو ژمارەی لە نێوان یەک و سێ دایه. *

**دووم‌ۆڕ** (مو.، کە.، هەورا.): شووم، بەدوودم، دۆبر. ووڵاخێکە دوو گێڕ (دێغ) ی لەنێو چاوانیدابێ، کە زۆر بەشووم دەناسرێت. ئەو کەسەیە تۆقسەری دووم‌ۆڕی پێوەبێ، کە ئەویش زۆر شووم و ناپەسندە.

**دوومۆهر** (باک.): وولاخی جوتە.

**دوومێرەکی**: مۆر، مۆن.

**دوون**: نزم، سووک.

**دوونان**: کەسێکە لە گەمەی قەڵەمندارێدا دوو جاران لەسەر یەک لە تۆپ بدات.

**دووناوگەڵ گرتن**: کلک بەناو گەڵ گرتن.

**دوونیەرەوەر**: بەدرەفتار. ـــ ی: بەدرەفتاری.

**دونگ** (ئەردە.): دەنگ.

**دوونگە**: مەری دوگ زل.*

**دوونگەمەرانێ**: گەمەیەکی منداڵانە.*

**دوونگەمەرێ**: بڕوانە: دوونگە مەرانێ.*

**دوونێ** (هەو.): دووێنێ.

**دوونیا**: دنیا.

**دوونیرۆ** (باک.): دووای نیوەڕۆیە.

**دوونیکل** (باک.): باڵندەیێکە سەربەکڵاو بێ.

دوونیکل

**دوونیمە**: چتێکە بووبێ بە دوو لەتی ڕاستەوە. ـــ بوون: بوونە دوولەت. ـــ کردن: کردنە دوو لەتی ڕاست.

**دووەشێن**: کلک وەشێن.

**دووەش** (کە.): ئەو چەڵەیە کە دەخرێتە ناوەندی شەغرەوە و بەقەدیدا قرچە هەڵدەچنرێ.

**دووهەڵگیر**: کلک گیر، کلک هەڵگر (بۆ ئەسپ).

**دووهەم**: دووەم. ـــ ین: دووەمین.

**دووهەند**: دووهێند، دووچەندان.

**دووهۆنی** (ئەردە.): دووڕوویی.

**دووهووردە** (کە.): ڕامیار، زۆرزان، کەمۆ، بەدۆلاب. ـــ یی: ڕامیاری، زۆرزانی، کەمۆیی، دۆلاب.

**دووهێشە** (ئەردە.): وەرد، دووگاسنە، زەوییەکە دووجار کێڵرابێ.

**دووهێند**: دووهەند، دووچەندان.

**دووێ**: دووێنێ، دووێکە. (هەورا.) دوو (٢).

**دووێت** (ئۆ.، گەرمێنێ، دەر.، ئەردە.): کچ، کیژ. دەوات، مەرەکەبدان.

**دووێتە**: دەوات، مەرەکەبدان. کچ.

**دووێدانۆک**: خەستەی توورەکەی دۆی.

**دووێر** (کە.): دیو، ژوو.

**دووێرد**: مقەست.

دووێردە

**دووێردە**: مقەست.

**دووێردک** (جا.): مقەست، دووێرد.

**دووێردی**: دیاری کردن.

**دووێشەو** (ئەردە.): دووێنێ شەوێ.

**دووێکە**: دووێنێکە.

**دووێڵ** (ئەردە.): دووێڵە، بەردی ناسک، تەختەبەرد.

**دووێڵبەن**: (ئەردە.) دێڵبەن: تەختە بەندی بەردی، بەردچن.

**دووێمی** (دەر.): دووگ.

**دووێن**: ئاخەفتەر. قسەکەر.

**دووێنە** (ئەردە.): دۆینە.

**دووێنی**: (باد.) دوهی، دووهوو، دوهە، دوهێنێ، دۆهە، (هەو.) دوونێ، (هەورا.، دەر.) دووێ، هێری، دوویین.

**دووی** (هەورا.): دوو. (باک.) دووەم.

**دوویت** (باک.): دەویت. (فە.، دەر.) کچ.

**دوویخ** (کە.): دووخ، ـــ ی ڕاست.

**دوویر** (کە.، باد.): دوور.

**دوویربین** (کە.): دووربین. (کە.) ـــ ی: دووربینی.

**دوویرۆک** (باد.): مێژوو.

**دوویرۆکفان** (باد.): مێژوونووس. (باد) ـــ ی: مێژوونووسی.

**دوویشەو**: دووێنێ شەوی.

**دووێڕووی تر** (هەورا.): دووڕۆژی تر.

**دوویساندن** (باک.): ئاخنینەوە، داگرتن.

**دوویک** (ڕۆژ.): تەشی.

**دوویکە**: دووێنێ.

**دوویڵ** (زا.، هەورا.): سیرمە.

**دووێکەرە**: دوو دووکەرە.

**دوویلک** (باد.): قونچکی مێوژی.

**دووێڵ** (ئەردە.): تەڵەبەرد.

**دووێڵبەن** (ئەردە.): شووێنی تەختە پۆشکراو بە تەڵەبەرد.

**دوویـن، دۆینـە** (بـاد.): دووان، ئاخـەفتن. (بـاک.) سـوواخدان. بـەدوو: سوواخدە.

**دووێن**: دووێنێ.

**دووینە**: بڕوێش و دۆی تێکەڵکراو و ووشک کراوەوەیە. کەشک.

**دووێن**: دۆینە.

**دۆینە**: دۆکوڵیو.

**دووێنە**: دووێنێ.

**دووێنێ**: دووێکە.

**دووێنێ شەو**: دووێ شەوێ.

**دوویین**: چێشتی دۆینە.

**دە** (بار.): گیشەی گیاو چرۆ و نیتر.

**دەار** (باک.): قوللە، بڵندایی.

**دەڤ** (باک.): تێکرا، گشت، هەموو.

**دەل** (باک.): دێڵ، دیڵەسەگ و نیتر.

**دەلک** (باک.): پشیلەی مێ.

**دەم** (باک.): دێم، بەیار.

**دەمک** (باک.): جوورە کاڵەکێکە.

**دهندار** (باک.): دارێکه.

**دهنگاله** (باک.): کانی، سەرچاوه.

**دهۆ** (جا.): ناڕاست. درڕۆنک، زوویر، دڵگیر.

**دهێل** (باک.): دەهۆڵ، دوهول.

**دێ**: لادێ، گوند، ئاوایی، دەگا، (فه.) جوون، دەی، چەند خانووێکە لە دووری شاراندا. (باک.) تا، هەتا، هەتاکوو، تاکوو. (مەنگور.) دایک. دێت لە مەولادێت، بۆیەکێکی نەدیو. لەسەر چاوگەی (هاتن) وەرگیراوە. لەکاتی هاندانی وولاخاندا بەکاردەبرێ بۆ فرۆشتنیان، دەه. (خۆ، ڕەوا.) گیشەی چرووانە بۆ زستانی ڕێک دەخەن، کە بدرێ بە ئاژاڵ و ماڵاتان، (ڕەوا.، خۆ.) دێچروو، گەڵ، گیدار. (فه.) سەقەڕ و باڵندەی گۆشت خۆرە. (باک.) دەبێ. دایک، داک: ــــ وباف: دایک و باب. گەڵای دارەبەڕوو و دارەمازوو، کە لێ دەکرێتەوە و لەناو لکی دارانـدا کۆمەڵدەکرێ بۆ زستانی ئاژاڵ و ماڵاتان. دەنگێکە لە وولاخ دەکرێ بۆ گێڕانەوەی لەکارێک.

**دێبەر** (شن.): زەوییەکە لەبەر ماڵان بێ. (گەرمێن) ڕۆژە جووتێکە لە زەوی. (بابا.) دێبەرە.

**دێبکه**: جەوەندە.

**دێبل** (باد.): شەیتان.

**دێت** (فه.): کچ.

دێت

**دێچروو** (ڕەوا.): کۆماو گیشەی چرووانە، کە خۆراکی ئاژاڵانە لە زستانێدا، دێ چڵوو.

**دێچڵوو**: دێچروو.

**دێخ**: شفت، شەفت، شەفتێ. داخ، دێخ، جەغز.

**دێخدێخ**: داخداخ.

**دێدار**: خاوەند دێ، خاوەند گوند. ــ ی : خاوەندێتی دێ، دێ ڕەنێوهێنان.

**دێده**: (موک.، باک.) خیچۆ، ئەت، (کۆ.) تاتک خووچە، خوچێ، (دەر.، ڕۆژ.) تاتە، (موک.) دێدی، یایێ، (هەو.) دادە، (هەورا.) داڵێ. بۆ شێواز بە خوشکی لە خۆ گەورەتر دەگوترێ. (هەورا.) زڕدایک. (ڕۆژ.، شەبە.) پوور، کە خوشکی باب بێ.

**دیدەکانێ** (هەورا.): دیلانێ.

**دێدک** (با.): سپڵی گیانداران.

**دێدێ** (موک.): دێدە، خوشکی گەورە. (موک.) بۆ ئاژۆتن و داکردنی گامێشان بەکاردەبرێ.

دێر

**دێر** (که.، فه.، هەورا.): درەنگ.

**دێر**: دەیر. کلیسای فەلە و دیانان، پەرستگای عیسایییانە.

**دێڕ**: ڕاسە، ڕزن. کەشە، خەت، دێغ، بۆ چووم، جغز، داخ، دێخ، گێڕ، چیر، خێز، قۆڕ، ڕێزێکە لە نووسراو یا چاپکراو.

**دێران**: جێ بوونەوەی چتێک لە چتێکیدا.

**دێڕان** (باک.): لە شێلگیردان. بدێرە: لە شێلگیربدە.

**دێران**: دەغل بە (ڤان) پاک کردن، کە وەکوو بێژنگییە، تەتەڵەکردن. بێژەونەوەی چتێک لە چتێکیدا، ئەو قابە دوو مەن دەدێڕی واتە دوو مەنی تێدا جێ دەبێتەوە.

**دێراندن**: ئاودانی زەوی. (باک.) دەلاندن.

**دێرانن** (ئەردە.): دێراندن، ئاودانی شینایی.

**دێراو**: (خۆ.) گۆل، بۆ، (ڕەوا.) باو، (دەر.) باوە، (دزە.) کەردوو، جۆگەیەکی هەڵدراوەوەیە چەند جوورە سەوزییەکی لەملاولای دەچەقێنرێ. دەراو شوێنێکە لە بێستان و تووتنجاڕاندا لەکاتی ئاودانی ئاوی پێدادەڕووا و تێشیدا ڕادەوەستێ.

**دێره** (فه.): درەنگە.

**دێرخێز**: درەنگخێز، لەشگران، سست.

**دێردغان** (باک.): دەردغانە.

**دێردێر**: دێخ دێخ، داخ داخ.

**دێرس** (ئەردە.): درەنگ.

**دێرسم**: چیایەکی کوردستانێیە خەڵکی وێ کوردێکی عەلیەڵڵایین بە ساز و سەمتووری بەناوبانگن.

**دێرسی** (ئەردە.): درەنگی.

**دێرک**: ناوی دوو شاری کوردانە یەکێکیان لەژێری جزیرەوبۆتانێیە و یەکێکیش کەوتۆتە ڕۆژاوای ماردینی. ــ ی (باک.): دیلانە، جوورە هەڵپەڕکێیەکی کوردییە.

**دێرنەدێز** (زا.): ئاگرێکی گەورەیە فەلان لە ڕۆژی چواردەی شوباتیدا دەکەنەوە.

**دێرۆ** (موک.): گیایەکە لە نێو چیایاندا دەڕووێ گەزێک بڵند دەبێ گەڵای وەکەرەوزی دەچێ هەر گوڵەی گۆلێکی دان تێدایە گیایەکە بەشینی لە باخەڵ یا لەناو نووێنان بنرێ کێچی تخوون ناکەوێ.

**دێرۆغە**: مەبەس لەوەیە لەکاتی ئاو کەمیدا، کە ماوەیەکی زۆری پێ بووێ تا دێراو پڕ دەبێ، ئاودێر بەناچاری دێراوی یەکەم پڕدەکات و دووایە لەوەوە دەراو دەکاتەوە بۆ دووەم و لە وێشەوە بۆ سێیەم هەر بەوجوورە تا هەموو دێراوەکان تێراو دەبن.

**دێرۆک** (باد.، باک.): مێژوو، دووێرۆک.

**دێرێک**: مێژی، دێرۆک، دێرێک، دیرۆک.

**دێری**: درەنگی. (باک.) جوورە کەوایەکە.

**دێرین**: کۆنینە، چتی زۆر کۆنە. (باک.) دێران. بدێرە: لە شێلگیر بدە.

**دێرینە**: کۆنینە، کەونینە. شووێنەواری کۆن.

**دێز**: ڕەنگی شینێکە بە ڕەشی بنوێنێ. ڕەنگی بۆرە بۆ گووێدرێژ و ئێستران بەکار دەبرێت، دێزە، ڕەشتاڵە. بە جنێو بۆ مرۆڤانیش بەکاردەبرێت.

**دێزه**: دێز، دیزە، خۆڵەمێش. وولاخی دێزە.

**دێزەڵه** (موک.): سەری ئێسکە خڕەکەی ڕانییە، کە دەچێتە ناو قوڵتەی ئێسکی لەشەوە.

**دێزپا**: سێ پا، سێ پایە، سێ کوچکە بۆ دیزە و مەنجەڵ و ئیتر.

**دێزک**: چتی دێز.

**دێزگ**: مەردومی کڵۆڵ.

**دێزی** (باک.): ئالک، ئالیک.

**دێزین** (باک.): دێران.

**دێژه**: ڕێ و شووێنی ئایینی (شریعە).

**دیسا:** دیسان.

**دیسان:** ئەمجارەش، جارێکی تر. *

**دێسپا** (هەورا.): سێکوچکە.

**دێسە** (زا.): مەڕەکێوی.

**دێسک** (باک.): شاکاشیە لە گڵ دروستدەکرێ. ماستی تێدا دروست دەکرێ.

**دێش** (باک.): مێگەلێکی گەورەیە.

**دێغ:** (باک.) داخ، داغ، بۆ چووم. خەت.

**دێغدێغ:** داخ داخ، داغ داغ، خەتخەت.

**دێڤونە** (هەورا.): دێوانە.

**دێغدار:** داغدار، خەتخەت، خەتدار.

**دێق:** دیق.

**دێقدێقە:** (ئەردە.) قینەقین. داخ، پەرۆش، خەفەت.

**دێکانە** (باد.): دەمووکانە.

**دێکانی:** لادێیی.

**دێکێ دێکی**(بار.): چاوچاو، تەماشاتەماشا.

**دێگە:** پوور، پلک، پلە.

**دێل** (باک.): دێڵ. توولەی مێوییە، کە درێژ دەبێ. مێیینەی داعبایانی کێوییە وەکوو سەگ، گورگ، بەراز و چەقەڵ، ڕێوی و وورچ و ئیتر. دیل، دهل، دەڵ، سەگی مێ.

**دێلاڤ** (باک.): ڕێژگەی چۆم و زێیان.

**دێڵە** (ئەردە.): دوورێل، چتێکە لە جیاتی چرپی لەسەر دارە ڕایە ڕادەخرێ.

**دێڵە بەبا:** (کە.) دێڵەوەوا، (هەورا.) دەڵەبەبا، دێڵی سەگ و جانەوەرانی ترە ،کە بەبا بێ.

**دێڵەبەن** (ئەردە.): دوورێڵ بەن.

**دێڵەسە:** دێڵەسەگ.

**دێڵەسەگ:** (باک.) دێلک، دێڵەسە.

**دێلەڤ** (باک.): جێ، جێگا.

**دێلەک:** دێڵەسەگ.

**دێڵەکانێ:** دێڵەکانی.

**دێلەکانی:** دیلانێ.

**دیلەگورگ:** گورگی مێ.

**دێلەمار** (زا.): بزن مژە.

**دێڵەوەوا** (کە.): دێڵەبەبا.

**دێلک** (باک.): دیڵەسەگ.

**دێلکەو:** کەوی مێ، ماکەو. *

**دێلمار** (باک.): سووسەمار.

**دێلندیر:** (باک.) دێلندێز.

**دێلندێز**(باک.): (باک.) دێلندیر، جێژنێکی فەلانە.

**دێڵێ:** چەند تەڵە بەردێکە لەسەر دارە ڕا دادەنرێ و قوڕە پەستی لەسەر دەکرێ.

**دێلی** (باک.): قایەی مێوێ. لکی دارە مێوی درێژە.

**دیلیز** (یەز.): ماڵ.

**دێم** (ڕەوا.): پشوو. ــ ێکی بدەینێ: با پشووێکی بدەینێ. زەوی و شیناوەردێکە تەنها ئاوی بارانەی بخواتەوە و بەدەست ئاو نەدرێت، دەیم، دەهم، بەیار، دێمەرۆک. (شکا.، باد.، ئەردە.) دیدار، چارە. ڕوخسار، ڕوو. (باک.) بەشی خووارەوەی ڕوخسارییە. (هەورا.) ڕوومەت، کوڵمە.

**دێماری** (باک.): زڕدایک، باوەژن.

**دێمانی:** خانەنشین.

**دێمەرۆک:** شوورێنی دێم، دێمەکار، دێم.

**دێمەرووک:** دێمەرۆک.

**دێمەزار:** دێمەرۆک.

**دێمەشۆرە** (هەورا.): ڕیشۆڵی ڕووی ژنان.

**دێمەکار:** شیناوەردێکە تەنها ئاوی بارانەی بخواتەوە و بەدەست ئاو نەدرێت، دێمەرۆک، دێم، (کۆ.) پشتاو (تەنها بۆ زەوی دەغلان دەبێ).

**دێمکە:** توورەکەیە لە چەرم یا لە قایشان دروست دەکرێ بۆ ئاوی خواردنەوە، جەوەندە.

**دێمگر** (باک.): قەڵەو، گووپن، ئاوساو، هەڵاّمساو.

**دێمگول** (باک.): ڕوومەتگوڵ.

**دێم ونایە:** جوورە یارییەکە چەند منداڵێک بەروو دووا دەست بە پشتی یەکتری دەگرن و گۆرانی دەڵێن.

**دێمی:** شیناوەردێکە لە شوورێنی دێم پەیدا بووبێ و تەنها ئاوی بارانە بخواتەوە.

**دێمیلە:** جوورە هەرزنێکە، (بانە.) هەرزنە گەورە، (شا.) کەڵدڕ، دەرە. کەردڕ، گاڵ، هەرزن. ترێزووی دێمی.

**دێن** (زرا.): (ژەن.) ووشک، ئیشک.

**دێنە** (فە.): دوورێنێ.

**دێندک** (باک.): دەیندک.

**دێنکە** (زرا.): چاو، تەماشاکە، بنۆڕە!.

**دێنێ** (باک.): ڕۆژی هەینی.

**دێو:** (ئاورێ.)دەئێقە، (کە.) ئەرژەنگ، (باک.) دڤ، دهۆ. درنج. جانەوەرێکی نەدیتراوە بەلاّن لەسەر ئەو بیروباوەڕەم، کە لەکاتی خۆی بۆ مرۆڤی کێوی بەکار براوە. (ئەردە.) دیو، ڕوو، لا.

**دێوا** (ئەردە.): دیبا، تافتە. ــ چە (ئەردە.): دیباچە.

**دێوان** (ئەردە.): کوورێخا، بەردەستی ئاغا.

**دێوانە:** شێت، ئەوداڵ، سەوداسەر، شێتۆکە، (ئەردە.) لێویاگ. ــ یی: شێتی.

**دێواندەر:** دیواندەر.

**دێواندێوکردن:** دیواندیوکردن.

**دێوانن** (ئەردە.): شێواندن.

**دێوەچ** (کە.): کوتکی جلشوشتنێیە، گلاَوکوتک.

**دێوەدەبانی** (کـە.): گیایـەکی ووردە و لـکەکانیشی بـاریکن، سەلکیشی وەکوو کارگییە.

**دێوەدەر:** چتی کونی دیواودەر. ـــ بوون: دیوەودەر بوون، کون بوون.

**دێوەرە:** چەرچی، دەستگێڕ.

**دێوەرژەن:** دزرژنگ.

**دێوەزمە:** شەوە، مێردەزمە، (پێن) تەنتەڵ، دیوەزمۆکە، دێوەلووکە.

**دێوەزمۆکە:** دێوەزمە.

**دێوەڵ** (لور.): پەرستنگە، پەرستگا.

**دێوەلۆکە** (کە.): جندۆکە، حیفریت.

**دێوەلووکە** (موک.): شەوە، دێوەزمە، بە مرۆی زل و کولکن و چڵکنیش دەکوترێ.

**دێوبەند:** نشتوو و تەڵەسمێکە بۆ پارێزگاری ساویلکان لە دێو و جندۆک و چتی کەڵکەلاَوی پووچ.

**دێوپەرست:** (ئاوێ.) دەنێقە یەسنە، شەیتان پەرست، ئەو کەسەیە وەدووی ئایینی پاکی زەردەشتی نەکەوتبێ. ـــ ی: شەیتان پەرستی.

**دێوجامە:** پەردەیێکی تـەخت سپییە چـەندگوڵێکی تێدایـە بـە پارچـەی ڕەنگاوڕەنگ ڕازاوەتـەوە، ڕاوکـەران بـە پێش خۆیانیـەوە دەگـرن لـە دوور باڵندەی تری بۆ دێ و ئـەویش بۆیـان دەچـێ تـا نزیکیـان دەبێتـەوە و بـە تفەنگی دەیانکووژێ.

**دێودڵ** (ئەردە.): دڵقایم، دڵسەخت.

**دیو:** ناوچە، چاوە خانوو، پێش یان پشتی هەر شت: من لەو دیو بووم.*

**دێوول** (باک.): چەپلە، تەقەتەق.

**دێوی:** دێوانە، کردەوەی دێوانە.

**دێهە:** ووشەیەکە وولاَخی بەرزەی پێ دەردەکرێ.

**دێهـات:** لادێیـان، گونـدان، دێیـان، چـەند دێیـەک. ـــ ی: لادێ یـی، دانیشتووانی گوندان.

**دێ:** ئیدی، ئیتر، ئیکـە، کـە، دن، ئیدیکـە، ئێدن، دیـتر، بـەلاَن تـەنها بـە دووای ووشـانەوە دەنووسـێ و بـە تـەنێ بـەکار نـابرێ: مـانگێکی دی، ساڵێکی دی: مانگێکی تر، ساڵێکی تر. دیتی: بۆ تاکە گیان لـەبـەرێکی نـەدیوو، کسـێ سێیـەمە بـۆ کـاتی ڕابـردووە، لـەسـەر چاوگـەی دیـتن وەرگیراوە. (شکا.) دایک. (کە.) حەلـەلـە، دەی، کسـکس، بۆ هـاندانی سەگان بەکاردەبرێ.

**دیار:** ڕوهنـد، شـتیار، بـەرچاو، بـیزار، خویـا، پـەیدا، ئاشکرا. ـــ بوون: دەرکـەوتن، پـەیدابوون، ئاشـکرابوون. ـــ کردن: دەرخسـتن، ئاشـکراکردن. خـاک، وولاَت، نیشـتمان، مەڵبـەند. لا، کـن، نـک، پێـش، تەنیشـت. دیدار، ڕوخسار، شێوە، دیم.

**دیارە:** ئاشکراس.

**دیارەهۆ:** دیاردی.

**دیاربەکر:** نێوی شارێکی کوردی ناسراوە.*

**دیاربوون** (دەر.، خۆ.، دزە.): دیارەهۆ، ڕیک (اشارە) یێکـە لـە ڕاوێدا، کە نێچیر دیاربێ ڕاوکەران بەو ووشە یەکتری ئاگادار دەکەنەوە و تاژیەکان ئامادەی پەلامار دەکەن. (هەورا.) دیاری.

**دیـاردی** (ئـەردە.): کێشـک، پاسـەوانی، دیدەوانـی. ووشـەیەکە لـەکاتی بەدی کردنی، کە نێچیر و بەدەورەدا خولانیـەوە ڕاوکـەر دەیڵێ. (ئەردە.) تەماڵ، دیار، ئاشکرا بوون، دەرکەوتن.

**دیاردی کردن:** بەدی کردنی نێچیر لەکاتی ڕاوێدا.

**دیارکردن:** ئاشکرا کردن، نیشانەکردن.*

**دیارگا:** ئاسۆگە، ئاسۆگا.

**دیارناو:** ناوی ناسراو، ناوی دیار.*

**دیـاری:** خـەلاَت. ئاشـکرا. ـــ کـردن: ئاشـکراکردن. (بـاک.) پـەروو. سەوقات، چتێکە ببرێ یا بنێردرێ بۆ دۆسـتێک، (هـەورا.) دیـاردی. نیشـانە، درووشم. ناوونیشـان. ـــ بوون: دیاربوون. ـــ دان: دەرکـەوتن، پـەیدابوون، ئاشـکرابوون. ـــ کـردن: نیشـانەکردنی دەزگیرانـە بـە نـاردنی دیاریەک دووای خووازبێنی.

**دیـان** (ئـەردە. کـەڵ، دەر.): ددان. فەلـە، عیسـایی. (هـەورا.) دیـتن، سەیرکردن، نۆڕین.

**دیانە:** زار، زارک، دەمی چتی. (ئەردە.) دانـەی چـت. نـاوی دێیـەکی گەورەیە لە باکووری ڕەواندزێ.

**دیانەدیانە** (بابا.): ددانەددانە.

**دیانەرۆکە** (هەورا.): چەق و چۆقی ددانان لـەکاتی سـەرما یا تاولـەرز و ترسدا.

**دیانەرێکی:** ددانەچیرە.

**دیان بەرەدەم:** ددانەکانی پێشەوەی زار.

**دیان پاکەوکەر:** پووشی ددان ئاژنینەوە.

**دیانچەرمگـــەوبوون:** ددان سـپی بوونـــەوە، ڕوودامـــاڵران، شـــەرم لـێ هەڵگیران.

**دیانرۆکلە** (ئـەردە.): دانەڕۆکـە، چێشـتێکە بەبۆنـەی دەرکـەوتنی ددانی منداڵان لـێ دەنرێ، دانوو، (موک.) دانوولە.

**دیانشاش:** ددان شاش.

**دیانکلیلەبوون:** دەم چوونەکلیلە.

**دیانقرۆڵ** (ئەردە.): ددان کلۆر، ددان پووک، پووت، قرۆڵ.

**دیان کاکیلە** (ئەردە.): کاکیلە.

**دیانگیر:** ددانگر.

**دیانکەنن** (ئـەردە.): ددانکێشـان، ددانکـەندن، ئـاهومێدبوون، نـاهمێ بوون.

**دیانکلێلەبوون:** ددان قووچاندن.

**دیانەکلێل:** دیانکلێل، ددانەی کلیلی.

**دیان لێ تیژکردن:** ددان لـێ تیژکردن، چاو تێ برین.

**دیاوە** (شو.): پاشەوە، لای پشتەوە.

**دیاووس پیتەر** (ئاو.): خوودای ئاسمان.

**دیای** (هەورا.): تەماشاکردن.

**دیە** (ئەردە.): خووێنبایی، پووڵێکە کوژیار بیدا بە کەسووکاری کوژراو. ـــ ی (هەورا.): دیتن.

**دیبا:** جوورە پارچەیێکی ئاوریشمییە و گرانە.

**دیباجە:** سەرەتا، پێشگۆتن، پێشگۆتنگ، دیواچە، بەرایێ، (باک.) بەربێژ، چەند مەبەسێکی ڕێک و پوختە، کە لەسەرەتای پەرتووکاندا دەنووسرێ.

**دیبەک** (هەر.): دنگ، دینگ، کووپەییێکی دارینە بە ئاسنێکی درێژی سەرلوولە برنج و گەنمی تێدەکوتن. (کە.) ئاوونگێکی گەورەیە بۆ کوتانی برنج و قاوە. (باد.) کیشەداری سووتاندنێیە.

**دیبەگ** (هەورا.): تەختە. دنگی گەورەی برنج کوتانێیە. (باد.) گزرە.

**دیتەر:** بینەر.

**دیتەنی:** خویا، شایانی دیتن، ئەوەیە کە بۆ دیتنێ دەست بدات.

**دیتر** (باک.): دی، دییکە. ڕۆژا ـــ : ڕۆژی دیکە.

**دیتراڕۆژی** (باک.): دووسبەی.

**دیتن:** بینین، چاو پێکەوتن، چاڤ لێ کەتن، دین، وینستن، چاڤ لێ بوون، (هەورا.) دیەی، دیناى، دیای. لە خۆڕا ـــ : توانین، پێکران، لە دەست هاتن.

**دیتنەوە:** دۆزینەوە، بیناندنەوە، پەیداکردنەوە، بەسەر کردنەوەی زیندەوار و چتی بزر و دزراو.

**دیخوون:** دێخوون، دۆخین.

**دیدار:** (ڕەوا.) سوورەدار، (باد.) دیندار، دارێکە وەداری بەڕووی دەچێ، سوورەدار. چارە، ڕوو، ڕوخسار، دیما، دیمان، دەم و چاو، شێوە. (ژاوە.) سەرباسک، سەردەست.

**دیداربین:** ڕوخسار بین، ڕووبین. ـــ ی: دیدەنی، ڕوخساربینی.

**دیدار و ئاخربوون:** مەبەس لە مردنی یەکێکییە لە پێش ئەوەدا کە خۆشەویست یا کەس و کاری خۆی ببینێ.

**دیدە** (هەورا.): چاو، چەم. ـــ ی بەد: چاوی پیس.

**دیدەڤان:** دیدەوان، پاسەوان، قەرەووڵ، کێشکچی. ـــ ی: دیدەوانی، پاسەوانی، کێشکچێتی.

**دیدەن:** دیتن. ـــ ی: چوونەلای یەکێکی بۆ چاو پێکەوتن، تازە کردنەوەی ئاشنایەتی، سەردان، سەرلێ دان، بەسەر کردنەوە، دیدار بینی. ـــ کردن: سەرلێ دان. ـــ ی کار: سەرلێدەر.

**دیدەنی دووبەدوو:** دیدەنی دروکەسی، دیدەنی نهێنی.

**دیدەوان:** چاودێر، نۆبەدار، کێشکچی، دیدەڤان، چاویار، دیاردی، دیاردی کێش، کەسێکە چاوەدێری چتێکی بکات. شۆفار. ـــ ی: دیدەڤانی، کێشکچێتی، چاودێری، چاویاری، دیاردی کێشان.

**دیدەی بەد:** چاوی پیس.

**دیدم** (فە.): پەرسلێرکە.

**دیدمان** (باک.): نەژاد. ـــ ی (باک.): نەژادی.

**دیدی، دوودوو** (فە.): دروکەڵ.

**دیر** (باد.، فە.): دوور.

**دیرەک:** تیرەک، ستوونی خێوەتانە، باسکەدار، (کە.) دیرەگ، تێلا. دارێکی کەمێ باریک و جارەکی (موقت) یە وەکوو کۆڵەکە وە بەر جێگایانی شکست دەدرێ. ـــ ی: جوورە هەنجیرێکە.

**دەیرگ** (کە.): دیرەک.

**دیرۆک** (باک.): دیرێک، مێژوو.

**دێریک** (باک.): مێژوو، دیرۆک.

**دێرێکڤان** (باک.): مێژوونووس. ـــ ی (باک.): مێژوونووسی.

**دێری:** درەنگی، دانیشتووی دێر.

**دیز** (باک.): دیزە، مەنجەڵ، قاپی گەورە. (کە.) دیک، بە هەموو چتێکی دەڵێن کە هەموو لایەکی خڕ بێت و لەسەر هیچ ڕوویەکی دانەنرێت.

**دیزان** (فە.): دامە.

**دیزانکردن** (فە.): دامەکردن.

**دیزە:** (هەورا.) گۆشێ، (باک.) ئەلبەکی، دەرپۆشک. کووپەڵەی گڵینی سوورەوەکراوەیە شۆرباوی تێدا لێ دەنێن. ـــ ی چکۆڵە: کۆخ خانە.

**دیزەبەدەرخۆنە:** مەبەس لەداپۆشین و شاردنەوەی ڕاز و کارێک.

**دیزەبەکۆڵ:** مەبەس یەکێکییە کە خاوەندی سامان یا ماڵ و منداڵێکی زۆربێ و نەتوانێ بە ئاسانی کۆچ و بار بکات.

**دیزەڵە:** چالآیی ژوور هەردوو سمت. دیزەی چکۆڵە.

**دیزەڵۆکە:** دیزەی چکۆلآنە.

**دیزەوگۆزە:** دەفر و گۆسکەی لە گڵ دروستکراو. *

**دیزەوگۆزەساز:** دەفر و گۆسکە لە گڵ دروستکەر. *

**دیزداشە:** دژداشە. *

**دیزک** (باک.): دیزەڵە، دیزەی بچووک.

**دیزی:** مەنجەڵۆک، دیزەی گچکە.

**دیسا** (باک.): دیسان.

**دیس** (ئەردە.): ئەندازە، پلە، پایە، کۆتایی.

**دیسان:** (باک.) دیسا، ئەوجاریش، هەمیسان، دووبارە، لەنوێوە، هەمیسانەوە، ئیتر.

**دیسانەوە:** دیسان، هەمیسان.

**دیش:** مراز. تر، کە، دیکە، بەدووای ووشانەوە دەنووسرێ: دووڕۆژی دیش: دووڕۆژی دیکە. (ئەردە.) پڕوپێتی ناوماڵ، ئەسپاو، مراز.

**دیشلەمە:** چای تاڵ، چای بێ شەکر، کولۆ شەکر لەدەم دەنرێ و چای تاڵی بەسەردا دەکرێ.

**دیف** (باد.): کلک.

**دیفک** (باد.): کلکی تەشی و چتی دیکە.

**دیڤ** (باد.): کلک. بەقەد، بەقەدەر.

**دیڤان** (باد.، زا.): دیوان.

**دیڤەلآن** (باد.): بە یەکێک دەکوترێ کە هەمیشە بەدووی یەکێکی ترەوە بێ.

**دیڤلێن:** پایتەخت.

**دیق:** دەردەباریکە، وەرەم، دەخمز. سووێ، خەفەتی دەروون. (باک.) تەماشایەکی نهێنییە لە کون و پەنایەکیدا. ـــ کرن: تەماشاکردن.

**دیق پێ کردن:** خەفەتبارکردن.

**دیق چوونەدڵ:** سووێ چوونەدڵ.

**دیقدار:** دەخەزدار. ــ ی: دەخەزداری.

**دیقدیقە:** قینە قینە.

**دیقدیقەدان:** قینەقینەدانی یەکێک.

**دیقکردن:** سووێ بوونەوە، دەردەباریکە گرتن.

**دیقکوژ:** لەسەرخۆ مردن.

**دیقل** (باک.): کەڵەباب.

**دیقلۆک** (هەر.): باپشکێو.

**دیق و شۆشی:** دیقی سیپەلاک.

**دیک** (فە.): تەشی. (باک.) کەڵەباب (کوردییە و تارەوی نیە). (کە.) بە هەموو چتێکی وادەڵێن کە هەموو لایەکی خرپێت و لەسەر هیچ ڕوویەکی دانەنرێت.

**دیکە:** ئیدی، دن، ئیدیکە، دیتر، ئی دی، ئیتر، دی، ئیکە، تر، تەنها بە دووای ووشانەوە دەنووسێ: ڕۆژێکی دیکە: ڕۆژێکی تر.

**دیکل** (شکا.، هەر.): کەڵەباب، کەڵەشێر.

**دیل:** ئێخسیر، گرتوو، بەندە، بەننە، (هەورا.، کە.) بەیدەست، بێ سەر، بندەست، ژێردەست، کەسێکە لە شەڕی دوژمنکاریدا گیرابێ.

**دیلات** (زا.): داوەت.

**دیلان** (ئەردە.): مرۆڤی گێل و هێڕ و شێتۆکە، شێت، دیوانە، حەیتە. (زا.، باد.) شایی، داوەت، ڕەشبەڵەک. (باک.) هەڵپەڕین، جوورە گۆرانییێکە.

**دیلانە** (باک.): هەڵپەڕین، دیلانێ. (کۆ.) گۆرانییێکی تایبەتییە لەنێو جۆلانەدا دەیڵێن.

**دیلانبێژ** (هەورا.، کۆ.): گۆرانی بێژ، شایەر.

**دیلانێ** (جا.): جۆلانە.

**دیلانی:** زەماوەند، گۆرانی چۆپی کێشانێ.

**دیلەک** (زا.): تکا.

**دیلەکانێ** (هەورا.): دار دەلاّمە.

**دیلەکچی** (زا.): تکاکار.

**دیلباز** (باک.): عیشوەباز، عیشوەگەر، (باک.) مرۆی کارزان و شارەزا.

**دیلم** (کە.): تیلم، کووز، قاش. ــ ێک کاڵەک: کووزێک کاڵەک.

**دیلمانج:** پروانە: وەرگێڕ.

**دیلوان** (کە.، دەر.): تەبەنە.

**دیلۆڤان** (باک.): بوتپەرست.

**دیلۆک** (باک.): جوورە گۆرانییێکی کوردییە بۆ هەڵپەڕینێ بەکاردەبرێ.

**دیلۆکڤان** (باک.): گۆرانی بێژ و دەنگخۆشی هەڵپەڕکێ.

**دیلهاتن:** ڕاستهاتن، دروستهاتن، دیتران.

**دیلی:** بندەستی، ژێردەستی، بەیدەستی.

**دیم** (هەورا.): بار، ڕوو، لا، ڕووکار، دیو، دیوی ئەملاولا. (موک.) چاوم پێ کەوت، دیتم، بۆ کەسی سێیەمە لە ڕابردووی نزیکدا لە سەرچاوگەی (دیتن) ەوە وەرگیراوە. (هەورا. کۆن) چارە، ڕوخسار، ڕوو، دیدار، دەم و چاو. (هەورا.) ژوور، (هۆدە) دیو، (هەورا.) زاج، خدە، سوخەت، پێناسراو.

**دیما:** دیدار، (شکا.) دێم، دیمانە.

**دیماتی** (زا.): دێکانی.

**دیمان** (زا.): چەشن و تەحرو شێوە.

**دیمانە:** دیان. پێ و قەدەم. ــ ت بەخێر: پێ و قەدەمت بەخێر.

**دیمانی** (باک.): دانیشتووانی شار و گوند و ئاوایی یان بە پێچەوانەی کۆچەر.

**دیمە** (ئەردە.): ڕوو، ڕوخسار، دەم و چاو. ڕووکیشی ساجی بە خۆڵەمێشی، ڕووکیشی دیواری، سوواخ. ــ دان: سوواخدان.

**دیمەشۆر:** ڕێشۆلی، دەم و چاوشوشتنی ژنان.

**دیمەشۆرە:** ڕیشۆل، چتێکە وەکوو سابوون ژنان دەم و چاوی خۆیانی پێ دەشۆن.

**دیمەک:** ئارەقە، (هەورا.) تەختەی دار یا بەڕژنی دارانە کە بۆ قایمی دەخرێتە نێودیوارانەوە. زەمانەی ئێرەق کە گاسنی تێدەخەن.

**دیمەن:** بەرچاو، پێشچاو، (باک.) بەرگە، چاوەنداز، بەرچاوگە، تەماشاگە، دیان. قەلافەت، (ڕۆژ.) تووێزم، شێوە، چەشن. بە ــ : کەڵ، زەلام.

**دیمبلی دیمباو** (ئەردە.): دمبڵی دمباو، دەنگی تەپڵ و دەهۆڵ.

**دین:** دیتن، بینین، چاوپێکەوتن. (باک.) ئایین، ڕارەوی. شێت، دێوانە. ــ بوون: شێت بوون. ــ کردن: شێت کردن. زان: دووێنێ کوڕێکی دی: واتە بووی.

**دینار:** دیناری پێشوو، زێڕی سووربووە، مسقاڵێک زێڕی لە سکەدراوە. برێتییە لە قاقەزێکی دەوڵەتی عیراقێ، کە بایی بیست درەمانە و خانیش فەرموویە:

دین چوو و نەکەت بەدەست مە دینار
پاش ژ نەچاری بوونە سفار

**دیناو** (ئەردە.): پەردەلاچوون.

**دینە** (فە.): دووێنێ. دۆزینەوە.

**دینەمێر** (باک.): ئازا، پڕدڵ.

**دینەوە:** دیتنەوە، دۆزینەوە. دیتنی مرۆ یا چتێک چەندین جاران، دووبارە دیدەنی یەکێکی یا چەند کەس و چتێکی کردن. پەیداکردنەوە.

**دینەوەر:** پڕ دەستەلات.

**دینج:** مات، بێ دەنگ، ئارام، هێدی. (شن.) ئاسوودە، بێ خەفەت.

**دیندار** (باک.): جوورە دارە بەرووێکی سەوزە بەلاّم گەلاّی زەردە.

**دینداری:** بەجێ هێنانی کارەکانی ئاینی بە باشی.

**دینگ:** (باک.) سۆقی، دیبەگ، دنگ، کووپەیێکی دارینی قووڵ و تەنگە بە دارێکی کە سەرێکی بەردێکی لێ بەستراوە و سەرێکیشی ئاسنێکی لوولەی تێگیراوە برنج و گەنم و چتی تری پێ سپی دەکەن. (هەو.) لەسەر جێگایەکی گمزێک بلند و خڕ بە قسڵ و گێچ سوواخدراوە بەرداشەکەی بە پانەوە لەسەر دادەمەزرێنن و دارێکی ئەستووری لە نێوەڕاستی بڕاوەوە لەسەر ویشەوە بەرداشێکی گەورەی دووهەندی بەرداشان ئەستوور بەقیتی لەسەر بەرداشەکە دادەنرێ و ئەوەش دارێکی

درێژە سەرێکی لەبەرداشە قایم و سەرێکیشی لە سەکۆکەی تێدەپەڕێ وولاَخێک بە دەوری سەکۆیەکەیدا دەگەڕێ و بەرداشەکەش بەسەر ئەوی بنەوەدا دەسووڕێ گەنم و برنج و ساواری پێ دەکوترێ.

**دینگە**: پایە، (ڕەوا.) پی پیزە. (کۆ.) دانگ، بۆ کەسێکی بەکاردەبرێ کە شەشدانگ سەرخۆشبێ. بۆ کەسێکی بەکاردەبرێ کە شەشدانگ کەربێ. بۆ چاک و باشیش بەکاردەبرێ. برنجیشی پێ دەکوترێ.

**دینۆ**: ناوی گۆرانییێکی کوردییە، ناوی کوڕێکی قارەمانی کوردستان سەید تاهای شەمزینی بوو، کە لە ۱۹۷۲ دا لە بەغدایە تەرمەکەی فڕێ درابووە لای ڕێگای قەتاری ئاسنینی.

**دینی، دینێتی** (باک.): شێتی، دێوانەیی.

**دیۆنەوەش** (هەورا.): دۆزینەوەی.

**دیو**: ژوور، (کە.) دووێر، (هەو.، کە.) ئۆدە، چاوە، (دەر.) دەق. ـــ ی ئاوردوو: ژووری ئاووردوو، (دەر.) چیلیان. ـــ ی دانەوێڵە: (دەر.) دەق داناش، (باک.) تعبەک. ـــ ی سفرە. ـــ ی مێلاقی. ـــ ی میوانان. ڕوو، ڕووکار، لا، ڕەخ، (باک.) ئالی، ڕووی جووانی کالاَ، ئەم مافوورە ـــ ی خۆی نیە.

**دیوا**: دیبا، پارچەیێکی نرخدارە لە ئاوریشمی.

**دیواچە**: دیباچە، پێشدەستی.

**دیوارخ**: (ئەردە.) تارا.

**دیواخان**: شووێنێکە لەناو خانوو کە بۆ میوانان تەرخانکرابێ، دیوەخانە، دیوانخانە، لەپێشدا تەنها خانان ـــ یان هەبوو.

**دیواخانە**: دیوەخانە.

**دیوار**: (باک.) تاک، تیکار، کۆسەر، دەبێ لەجیوار هاتبێ لەناو ئێلی نومەریا و هێندێک کوردی مایی (د) بە (ج) دەگۆڕن جیوار واتە جێگای وار و بارخستن و دانیشتن. بندیوار: پالقانچک.

**دیوارە** (ئەردە.): زێواری چت، چەپەر، دیوارێکە لە چەپەر دروستکرابێ.

**دیواربڕ**: مەساسە، پارچە ئاسنێکی سەرتیژە دیواری پێ کون دەکرێ لە لایەن وەستایان یا دزانەوە.

**دیواربڕین**: کون کردنی دیوار.*

**دیواردیوارانێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانەیە.

**دیوارکۆ** (هەورا.): ڕفحە، ڕفە، تاقەهەرەتەسکەکەی سەرەوەی تاقانە لە دیواری وە تاغاندا سا لەناو دیواردا دروستکرابێ یا لە تەختە.

**دیوان**: کۆڕ، کۆمەڵە، جڤات، (باک.) دیڤان، دیوەخان، دیواخان. دائیرە، میری، حکوومەت. دیوەخانە، دیوانخانە، ـــ ی پادشاومیران، دیوانی بووێژان: پەرتووکی تایبەتی هەستیارێک.

**دیوانخانە**: دیوان، دیواخان.

**دیوانەدەر**: دیواودەر.

**دیوانەدر**: مرۆڤی دەمراست، دەمپەراش.

**دیوانەیێو**: پشتەوڕوو، هەڵگێردراو.

**دیوانەیێوکردن**: دیواودیوکردن.

**دیوانەیێوکردن**: هەڵگێرانەوەی چت و ئەمدیوە و دیو پێ کردنی.

**دیوانەسەرا**: سەرای دەوڵەت.

**دیوانشا**: دیوانی میری.

# ر

**ر**: تیپێکی ئابێی کوردییە.

**ڕا**: مرازێکە بە سەری هەر ووشەیەکیەوە بنووسێ واتاو شێوەشی دەگۆڕێ وەکوو: بردن: ڕابردن، بوون: ڕابوون. کردن: ڕاکردن، کرن: ڕاکرن. دان: ڕادان، خستن: ڕاخستن. گرتن: ڕاگرتن، ڕەوی: ڕاڕەوی. کوشین: ڕاکوشین، بەری کردن: ڕابەری کردن. پەڕین: ڕاپەڕین، پسکاندن: ڕاپسکاندن. دار: ڕادار، هێنان: ڕاهێنان. لینگ، غار، خار، هەڵینگ، هەڕا. ـــ کردن: غاردان، لینگدان، هەڕاکردن. پەسند، قوڵکێشان، باش. ـــ لێ بوون: پەسندکردن، بەباش زانین. تەگبیر، بیروڕا، باوەڕی، گوور. (هەورا.، فە.، ئەردە.)، ڕێ، ڕێگا. جار، چەل، کەڕەت، نۆبە، چین. (ئەردە.) هەل، کایە، گل، کەشە. (لو.، فە.) بۆ، لۆ، سەبارەت. (باک.) ڕەگ، دەمار، ڕیشە، ڕایێ ستوور: دەمار، شادەمار. تین، پێز، کێش: ئەم گەفە بە ـــ یە: بەپێزە، کێشی هەیە، نانی جووانی لێدێ.

**ڕاناو** (ئەردە.): بەلووعە، ڕێ ئاو، ڕێگە ئاو، دەراو.

**ڕانەسپاردە**: ڕاسپاردە.

**ڕانەسپاردن**: ڕاسپاردن، قەوینی لێ کرن، ڕاسپێری.

**ڕانەسپێر**: ڕاسپێر.

**ڕانەسپێرراو**: ڕاسپێر راو.

**ڕانەنگاوتە**: ڕایە ڵکراو.

**ڕانە نگاوتن**: ڕایە ڵکردنی تەناف و بەن و چتی تر.

**ڕانێڵ**: ڕایەڵ.

**ڕابارتن**: (باک.)، ڕابوواردن، ڕابێرە.

**ڕابە**: (باک.)، هەستە، هەڵستە، هۆرزە.

**ڕابەر**: ڕێبەر، ڕێ نیشاندەر، پێشڕەو. کەسێکە ڕاسپاردە یا نامەی خەڵکی بە یەکتری بگەیەنێ، پێغەمبەر، پەیغامبەر. پێشەوا، بەڵەد، شارەزا. نێوی نێرینانە.

**ڕابەرتن**: (باک.)، ڕابارتن، ڕابوواردن.

**ڕابەرووپۆلیس**: (هەورا.) کەلاَنتەر.

**ڕابەری**: ڕێ بەری، ڕێگانیشاندان، ڕاغوونی، بەڵەدی، شارەزایی، گەیاندنی نامە یا ڕاسپاردەی ئەم و ئەوە بەیەکتری. پەیغامبەری، پێغەمبەری.

**ڕابەری ئۆردوو**: دیدەوان، پێشقەرەووڵ.

**ڕابەری کردن**: ڕێ نیشاندان.

**ڕابەزاندن**: (باک.) بەزاندن، پێ وەستان، دەرەقەتهاتن.

**ڕابەست**: (باک.) جوورە تابووتێکە نەخۆشی تێ دەنرێت.

**ڕابەستن**: (باک.) ڕەفتارکردن، چگۆنی.

**ڕابەل:** (باک.) تووڕە، قەڵس، سەرگەرم. ـــ کرن: تووڕە و سەرگرم بوون. ـــ ی: تووڕەیی، قەڵسی.

**ڕابران:** تێ پەڕین، بوورین، ڕۆیشتن. لە دەست دەرچوون.

**ڕابردن:** ویاران، ویەردەن، تێکشان، ڕابوورین، (باک.) بۆرین، بۆرینۆ. تێپەڕین، بوورین، بوهوورتن، بوهارتن. لە دەست چوون، لە دەستدەرچوون، کات نەمان. کار یا چتێک لە پلەو یا لەکاتی خۆی دەرچوون.

**ڕابردوو:** تێپەڕیو، ڕابووردوو.

**ڕابەکار:** (ئەردە.) ڕێبووار، ڕێبکار.

**ڕابەکردن:** (ئەردە.) ڕابوواردن، ڕابووردن، ڕۆیین، ڕۆیشتن.

**ڕابووار:** ڕێبووار.

**ڕابوواردن:** بەسەربردن، ڕابەرتن، ڕابارتن، کات بەسەربردن. تێپەڕاندن.

**ڕابوورده:** ڕابردوو، کاتی تێپە ڕیو.

**ڕابووردن:** تێپەڕین.

**ڕابووردوو:** تێپەڕیو.

**ڕابوورین:** ڕابووردن، ڕابردن، تێپەڕین.

**ڕابوون:** (باک.) هەستان، هەڵستان، هەستانە سەرپێیان، (هەورا.) هۆرزان. ڕابە: هەستە، هەڵسە، هەڵستە، (باک.) لە خەوهەستان، بێداربوونەوە، وەئاگاهاتنەوە، ڕابە: لەخەوهەستە، هەڵسە. سەرکەوتن، هەستان، هەڵکردن. ئاف ڕادبە: ئاوسەر دەکەوێ، ئاوهەڵدەستێ. باڕابوو: باهەڵیکردێ. کەلاوی ڕابوو: ڕقی هەستا. بۆ نیشاندانی مەبەس و بەسەرهاتنی ناگەهانی بە کاردەبرێ. ڕابوو چوو: هەستا ڕۆیشت. ژێ ڕابوون: جێگابەجێ هێشتن. ژ بەر وی ـــ: لە بەر وی هەڵات و ڕۆیشت. لێ ـــ: هێرش بردن. سەرخووەڕابوون: هەستان، شۆڕشکردن. تێ ڕابوون: تێوەچوون.

**ڕابین:** (باک.) ڕابوون.

**ڕابینۆک:** (باک.) جۆلانەی منداڵانە وەکوو لانک و لەیلووکی وایە منداڵی تێدا ڕادەژێنن تابنووێ بە دووگوریسان قایم کراوە. (هەورا.) لە لووە.

**ڕابینین:** ڕاپەڕموون.

**ڕاپاندن:** (باک.) داپۆشین، شاردنەوە. ڕاپینە: داپۆشە.

**ڕاپەڕ:** دەست وبرد، گورج وگۆڵی. بە ـــ: بە دەست وبرد.

**ڕاپەڕان:** هەستان، داچڵەکان، داپەڕان.

**ڕاپەڕاندن:** داپەڕاندن، هەستاندن، داچڵەکاندن، لەنەکاو لە خەو بێدارکردنەوە، سەرپەڵۆ. دەربازکردن، ڕزگارکردن، تێپەڕاندن، بهووراندن. چت بە دزیەوە ڕماندن. بەتەڕدەستی کۆتایی بە کار و فەرماندان.

**ڕاپەڕموون:** (هەورا.) ڕابینین، تێڕادیتن، ئومێدکردن.

**ڕاپەڕین:** (باک.) ڕاپەڕموون. دەرپەڕین، تێپەڕین. (باک.) بوهوورتن، (باک.) بووهارتن. لەخەو ـــ: لەنەکاو لەخەودا ڕاچڵەکین و بێداربوونەوە، ڕاچڵەکان، داچڵەکین. (باک.) پەڕینەوە. ڕاپەڕە: بپەڕەوە.

**ڕاپەژلین:** (باک.) بەنێردیوانیدا سەرکەوتن و چوونەسەر.

**ڕاپەلقین** (باک): لە مستیدا کوشین.

**ڕاپەلین:** (باک.) پەڕینەوە(لە ئاو و ڕووباران). ڕاپەلە: بپەڕەوە.

**ڕاپسکان:** هەڵدان بۆ خۆڕزگار کردن. ڕزگاربوون، ڕاپسکنان.

**ڕاپسکاندن:** ڕزگار کردن. خۆ ـــ: خۆڕزگار کردن لەتەنگ و چەڵەمە. فڕاندنی چتێک لە دەست یەکێکی لەناکاو.

**ڕاپۆرت:** بەزمان یا بە نامە لەیەکێک دوران بەخراپە، وەڵام، دەنگ وباس.

**ڕاپۆرتچی:** زمان لێدەر.

**ڕاپێچ:** ڕاماڵ.

**ڕاپێچان:** ڕاماڵین، داماڵین، ڕێ لێ گرتن و بردن، کۆکردنەوە و ڕاماڵین، ڕاپێچ کردن، (باک.) قۆڵی خۆهەڵکردن و خۆگورج و ئامادەکردن.

**ڕاپێچەک:** ڕاپێچ.

**ڕاپێچەکدان:** ڕاپێچدان، ڕاماڵین.

**ڕاپێچەکدەر:** ڕاماڵەر، ڕاپێچەر.

**ڕاپێچدان:** ڕاپێچان.

**ڕاپێچکردن:** فڕاندنی چتێک خێرا لەلایەن با یا ئاو یا گیاندارێکەوە.

**ڕاپێکردن:** غارپێدان، بەزاندن.

**ڕاپیتە:** هاموشۆکردنێکی زۆرە لە جێگایەکیدا.

**ڕاتەکان:** ڕاوەشان، هەڵتەکان، ڕاتڵەکان، ڕاچڵەکین، جووڵانەوەی چت بەهۆی ڕاتەکانیەوە.

**ڕاتەکاندن:** ڕاتڵەکاندن، هەڵتەکاندن، ڕاوەشاندن، جووڵاندن.

**ڕاتەوراندن:** (ڕەوا، خۆ.)، کۆزکردن، بەستنەوەی وولاخان بە گوریسێکی درێژ بۆ لەوەڕاندن و دوورنەکەوتنەوەی.

**ڕاتڵەقان:** ڕاتڵەقاندن.

**ڕاتڵەقاندن:** ژاندنی مەشکە و ڕاژاندنی لانک و جۆلانە و ئیتر. ئاو لە قابێکی وەردان.

**ڕاتڵەقانن:** ڕاتڵەقاندن، مەشکەژاندن.

**ڕاتڵەکان:** ڕاوەشان، (کۆ.) ڕاتەکان.

**ڕاتڵەکاندن:** ڕاوەشاندن، (کۆ.) ڕاتەکاندن.

**ڕاتوو:** ڕۆژانە لە پارە یا نان کە بدرێ بە هەژاران. جیرە، مووچە.

**ڕاتوول:** (باک.) گەڕیدە، ئاوارە، هەرزەگەڕ. ـــ ی (باک.) گەڕیدەیی، هەرزەگەڕی.

**ڕاجە:** (کە.) کاریتەی خانووان. ڕایەڵی داری دارەڕای خانوو. (ئەردە.) داری درێژە وەک بەرچیغ. ئالوودار، داری دارەڕایە. تەیاخ.

**ڕاچاندن:** تەنینی بەڕە و مافوورە و ئیتر چنین. (هەورا.) دارتەکاندن (بۆ بەری.). وەشاندن. هەژاندن، لەرزاندن. (ڕەوا.) ڕایەڵکردنی گوریس و یا تەناف بۆ چتمەکی شۆڕاو لەسەر هەڵخستن. قرم لە ژنی خەڵکی خۆشکردن، ئافرەتی خەڵکی ڕەچاوکردن، حەزلە ناموسی خەڵکی کردن.

**ڕاچەراندن:** لەوەڕاندن.

**ڕاچەڵکان:** ڕاچەنین، ڕاپەڕین.

**ڕاچەڵکاندن:** ڕاچەناندن، ڕاپەڕاندن.

**ڕاچەڵکین:** (کە.) ڕاپەڕین، ڕاچەنین.

**ڕاچەنەاندن:** ڕاچڵەکاندن، خوریە لەدڵخستن، چێوورکردن، خورپاندن، ڕاچەلکاندن، داخورپاندن، ڕاچڵەکاندن، لەپڕ ڕا ترساندن.

**ڕاچەنین:** داخورپان، لەپڕڕاترسان، خورپەلەدڵ کەوتن، داچڵەکان، خورپان، داچڵەکین، ڕاچڵەکین، (کە.) ڕاچنین، هلچەنین، چێوورببوون، ڕاپەڕین، داپەڕین، ڕاچەلکان، ڕاچەلکین.

**ڕاچەنیو:** ڕاپەڕیو، داپەڕیو.

**ڕاچڵەکان:** هەژان، ڕاچەنین. ڕاچڵەکین، داچڵەکان.

**ڕاچڵەکاندن:** هەژاندن، ڕاچەناندن. ڕاپەڕاندنی گیاندار لە ناکاو.

**ڕاچڵەکین:** داپەڕین، داپەڕان، ڕاپەڕین، ڕاپەڕان، ڕاچڵەکان.

**ڕاچنین:** (دزە.) ڕاپێڵ کردن.

**ڕاچوواندن:** تێڕاکردن، تێهەڵچەقاندن.

**ڕاچوون:** تێڕاچوون، تێڕۆچوون، تێهەڵچەقان.

**ڕاچوون:** ڕۆچوون.

**ڕاچێت:** ڕەچێتەی پزشکان.

**ڕاخەر:** ژێرە خەر، ڕایەخ. داخەر، ڕایێخەر.

**ڕاخران:** داخران، تەپسین.

**ڕاخراو:** داخراو، ڕامرین. بەرە یامافوور و حەسیر و چتی ترە کە ڕاخرابێ، بەرێ کراو.

**ڕاخزین:** داخوشین، خوشین، ڕاخووین.

**ڕاخستن:** ڤەکشکاندن، تەپساندن، ڤەلشاندن. ڕامدانـدن، ڕامـەزاندن، (هەورا.) بیاوەشەرە. ڕاخسن، ڕادان، (باک.) تۆلکرن، داخستن، کردنە ڕایـاخ، ڕایێخستن . پـاک و بلاوکردنـەوەی ژێـرە خـەرە لـەسـەر زەوی. (ئەردە.) خستنەرێگا، بـەرێ کردن، ڕەوانـەکردن، ڕێگەخستن. (ئەردە.) ڕامل خستن، خستنەملی.

**ڕاخشین:** خوشین، ڕاخوشین.

**ڕاخووت:** (دەر.) بۆخۆت، (هەورا.) پەیوێت.

**ڕاخورین:** تـێڕاخورین، فـەرماندان، گوڕانـدن. لـێ ــ : بەسـەریداگوڕاندن، دەنگدان. پشت بەکـەسـێک بەسـتن، خورپـن؛ بـەکێ و بەپشـتیوانی کـێ دەخورێ.

**ڕاخوستن:** (زێبا.) پەنابردن.

**ڕاخوشین:** خوشینی مـار و زیندەوارانـی بـێ پـێ بەسـەر زگـدا. ڕاخزیـن، ڕاخشین.

**ڕادار:** باج ئەستێن، باجگر، ئەوکەسەیە باجی بستێنێ. (ئەردە.) کەسێکە ئاگای لە ڕێ و بانان بێ، ڕاگیر. (ئەردە.) تەریدە، جەردە، چەتە

**ڕادارانە:** باج، ڕاداری.

**ڕادارخانە:** باجگە، باجگا، باجخانە.

**ڕاداری:** باج ئەستاندن.

**ڕاداشتن:** نیشاندان. دەست ــ : بەدەستی نیشاندان. چتێک بە دەستییە ڕوو بە کەسێکی ڕاگرتن تالێی وەرگیرێ. ــ ی منداڵ: ڕپاندن، میز و گوو پێ کردنی منـداڵ، ڕاهێشـتنی منـداڵ. دابەسـتنی ئـاژاڵ یـا مـالات بـۆ قاوورمە.

**ڕادان :** وەلانان، خاوێنکردنەوە، جۆماڵکردن. (موک.) ڕانین، دەرکردن، ڕاونـان، فـڕێدان، لـێ خوڕیـن، ڕامـاڵینی چـت بـەمەلاولادا. (ڕەوا.) ڕاهێشتن، دان، ــ ی بانگ: بانگدان. (باک) ڕاخستن. دروستکردن.

**ڕادان سەر** (باک): هێرش بردنە سەر، زگدڕین بەخەنجەر؛ زگی... ی ڕادا.

**ڕادانی:** دروستکردنی تایبەتی. بە ــ دان: بە تایبەتی بە دروستکردن.

**ڕادە:** پلە، پایە، پەرەسە، سنوور، ئەندازە، بەو ــ یە: بەو پلە و ئەندازەیە.

**ڕاددە:** ڕادە.

**ڕادەر:** ئاژووە، لێخوڕ.

**ڕادوو:** ڕەدوو، ــ کەوتن: ڕەدوو کەوتن.

**ڕادوو** (ئـەردە.): ڕەدوو کـەوتوو، ئافرەتێکـە بـەدووی پیـاوێکی بێگانـە بکەوێ و هەڵگیرێ.

**ڕادووکەوتن:** شووێنکەوتنی ئافرەتە بە دووی پیاوێکی بێگانەدا.

**ڕادوونان:** ڕاونان.

**ڕادێر:** کەسێکە منداڵی بۆ ڕپانێ ڕادێرێ.

**ڕادێران:** ڕاداشتنی منداڵ، پیسایی پێکردنی.

**ڕادیتن:** پیارا پەربوون، تێڕادیتن.

**ڕادیشۆ:** (باد) مزر، مەیخۆش، ترش و شیرین.

**ڕادیۆ:** گێڕەوە، جوورە مجرییەکە بە هۆی هێزی کارەبا یا پیلەوە گۆزانی و ئاخۆتنی لە ئێستگەی شاران وەر دەگرێ و دەیگێڕێتەوە.

**ڕاز:** سەگی یاخی.

**ڕاڕ** (ئەردە.): چتی زۆر کولاو. فرە کوڵیاگ.

**ڕاڕا:** (ئـەردە.) میـل میـل، میـڵ میـڵ، دێردێـر، دێـغ دێـغ، خێر خێر، خەتخەت. شووێنێکە چـەند ڕێگایـەکی لـێ جـووێ بێتـەوە. وازی وازی، جینگەنـە، دوو دڵ کـەسـێکە هەردەمـەی لـەسـەر هـەوەس و کەڵکەڵـەیێکی بێت. ــ یی: وازی وازێتی، دوو دڵـی، بوونـی مـرۆ هەردەمـەی لـەسـەر هەوەسێکی.

**ڕاڕەنگی:** جوورە پرتەقاڵێکە، پرتەقاڵ لە نارنجێ پەیوەندکرێ: ڕاڕەنگی دێنێ.

**ڕاڕەو:**(هـەورا.) جێگـای ڕۆیشـتن و تێپـەڕین، ڕێـڕە و تێپەڕگـە، داڵان، بێلایی، هەیوان.

**ڕاڕەوا:** ڕێبووار.

**ڕاڕەوە:** (موک.) دوو تەختە پانەکانی سەرینگان و پێینگانی لانکێیە کـە لـەسـەر زەوی دادەنرێـن وە لانـک لـەسـەر وانـەوە ڕادەژێ. (کـۆ.) ڕەوڕە. (ڕەوا.) ڕواڵە.

**ڕارفان:** ڕفان، غارداني گیانداره بەهۆی ڕارفاندنیەوە.

**ڕارفاندن:** ڕفاندن، ڕاونان، ڕاوە دوونان و دواکەوتنی گیاندارێکی.

**ڕارفێن:** ڕفێن. ڕفان، ڕارفان.

**ڕارفێنەر:** ڕفێنەر، ڕاونەر.

**ڕاز:** قسـە، ووتـە، واتـە، گوفتـار. مەبەسـتی نهێنـی و پـەنهان، (بـاک.) پـنی، نهێنـی، پەنامـەکی ــ ی کـەسـێ ئاشکرا مەکـە. کـۆڕی نـاخۆتن. داستان، سـەربردە، بەسـەرهات، چیرۆک. (خـۆ.) ڕێگایـە، کـە بەسـەر تیوەرانـدا بـڕوا، (ڕەوا.) لات. (بـل.) گـەوەر، شووێنـی سـەخت و تـووش، شووێنێکە لـەسـەر تیوەرانـی سـەخت و تـووش ئـەوەندەی تاقـە کـەسـێک لـە

سەری ڕاوەستێ یا چەند پێیەک بەسەریدا بڕوات. ئەو چیایە وابێ یا قوولبێ یا پەنایەک بێ کەسی لەسەر و خوارەوە نەگاتێ، تیوەڕ.

**ڕازان:** بەخشڵ و جل و بەرگی نوێ و جووان ڕازانەوە خەملان، خەملین، ڕازیای. (باک) نوستن، پاڵکەوتن، خەفتن، نقستن.

**ڕازانەوە:** ڕازان، خۆ جووانکردن، بەدەوری خۆهەڵاتن، خەملان، خەملین، جووان بوون.

**ڕازاندن:** جووانکردن، ڕازاندنەوە. (باک) نوواندن، دەرخستن.

**ڕازاندنەوە:** خەملاندن، جووانکردن، تەدارەک گرتن، ڕێک وپێک و پوختکردن.

**ڕازاندنەوە:** خەملان.

**ڕازراوەوە:** خەملیو، خەملان، ڕازێنراوەوە.

**ڕازانن:** ڕازاندنەوە، خەملاندن، جووانکردن.

**ڕازاننەوە:** ڕازاندنەوە.

**ڕازاو:** نێوی ئافرەتە.

**ڕازاوە:** خۆ جووانکردوو، بەدەوری خۆهەڵاتوو، ڕازێنراوەوە.

**ڕازاوەوە:** (باک.) بەردلکری، خەملیو، جووانکراو.

**ڕازە** (هەورا.): چیرۆک، ڕێگا.

**ڕازەر** (باک): شەپۆلی دەنگان، دەنگدانەوە لە ناو گەرماو و ئەشکەوتان، ـــ کرن: دەنگدانەوەی دەنگ.

**ڕازەن:** ڕێگر، جەردە، چەتە، تەریدە، دزگەردنە.

**ڕازدار:** ڕاز ڕاگر. ـــ ی: ڕازڕاگرتن.

**ڕازڕاگر:** دەمگرتی، ڕازدار.

**ڕازداف** (باک): خۆش، مەزەدار، بەتام، ناسک. ـــ ی: خۆشی، مەزەداری، بەتامی.

**ڕازپانەگر:** گووێ پەل، پرپرس، زاردڕاو، دەم دڕاو، دەڤدڕیا.

**ڕازقی** (موک.): ڕاسقی، سرعانی، جوورەترێیەکە وەک سپیکە وایە بەلان ئەم کەمێ تفتە. جوورە گوڵێکی سپی بۆنخۆشی پەسندە گەلای وەکوو هی بامیەی وایە.

**ڕازنووس:** سکاڵانووس.

**ڕازنووسەر:** ڕازنووس. ـــ ی: ڕازنووسی.

**ڕازنووسی:** ڕازنوویسی.

**ڕازنوویس:** ڕازنووس. ـــ ی: ڕازنووسی.

**ڕازیانە:** (هەورا.) ڕەزنە . ڕەزیانە، هەپۆسان، گیایەکی بڵندە گەڵایەکانی وەنی شووتی دەچێ بۆنی خۆشە لەناو نان دەکرێ، تۆوەکەی وەکوو زیرە وایە بۆ ژانە دڵ باشە.

**ڕازیانەوە:** ڕازانەوە.

**ڕازیاوە:** ڕازاوەوە، خەملیو.

**ڕازیای** (هەورا.): ڕازاندنەوە.

**ڕازێنەر:** خەملین، جووانکەر، چەت، کەسێکە گیان لەبەر یا چتێکی بخەملێنێ و بیرازێنێتەوە.

**ڕازێنەوە:** ڕازێنەر، خەملین، چەت.

**ڕازی:** نێوی نێرینانە، نازناوی هەستیارێکی کوردە. دڵخۆش، قایل.

**ڕازین** (باد.): ڕازان، درێژبوون ونوستن. ڕازانەوەئامادەبوون.

**ڕازی نیهانی:** مەبەسی پەنهانی، ڕێزەی ڕاز.

**ڕاژان:** هەژان، هێژان، دەرگوشین.

**ڕاژاندن:** هەژاندن، دەرگوشاندن، ڕاژەنین، هێژاندن.

**ڕاژە** (جا.): دەستەک، دەسەک، ئالوودار، داری دارەڕایە.

**ڕاژە:** کاریتەی کەپر و ساباتان.

**ڕاژەندن:** ڕاژاندنی لانک و جۆلانە و چتی تر.

**ڕاژەنین** (کە.): هەژاندن، ڕاژاندن، جوولاندنەوەی چتێک بە هێز.

**ڕاژۆ:** نکتە.

**ڕاژۆر** (باک.): باکوور.

**ڕاژێر** (باک.): باشوور.

**ڕاژێن:** ڕاژێنەر.

**ڕاژێنەر:** جوولێنەر، جوولێن، هەژێن، هەژێنەر، تەکاندەر، ژێن.

**ڕاژی** (باڵ.): لەڕ، لاواز.

**ڕاس** (هەورا.): ڕاست یادرووست، ئوـ ماچی: تۆ ڕاستەدڵێی. (ئەردە.) قیت، ڕاست، (ئەردە.) وێسیاگ. بە پێچەوانەی شۆڕوولارییە.

**ڕاسا** (ئەردە.): ڕاستەوخۆ، ڕاستەوڕاست.

**ڕاسان:** ڕاستان، خوراو ـ :خوداوڕاستان واتا هەلێکی باش و دەرفەت و هەلکەوتێکی باش. خۆبۆلێدانی گیان لەبەرێکی ئامادەکردن، پەل بزاوتن، داڕسان. خورێن لە لووت هاتن، فشین، دابوون، دابووژن.

**ڕاسایی:** تەختایی، ڕاستایی، هاماری.

**ڕاسە:** ڕاستە. ڕزن، دەستە، پۆل، چین.

**ڕاسەر** (باک.): دەستەلات، زەوت، زاڵ.لای ژووروو، لای سەرەوە. ـــ ێ بوون: دەستەلات، بەسەر ـــ دا پێ شکان. ـــ کرن: زەوت کردن، دەست بەسەردا گرتن.

**ڕاسەرین** (باک.): بەرز، بڵند.

**ڕاسەقانی:** ڕاستەقینە.

**ڕاسەوبوون:** بە دەستەلات بوون، ڕاست بوونەوە، هەستان، قیت بوونەوە.

**ڕاسەوکردن:** ڕاستکردنەوە، هەستاندن، ڕاستەوەکردن.

**ڕاسپاردە:** ئەسپاردە، پەیغام. پەیغامبەر، پێغەمبەر، کەسێکی ووتەی یەکێکی ببا بۆ یەکێکی دی.

**ڕاسپاردن:** سپارتن، ڕا ئەسپاردن، ناردنی ووتەیەک بە یەکێکیدا بۆ یەکێکی تر.

**ڕاسپۆش:** ڕاستپۆش، درۆزن، کەسێکە ڕاستی بشارێتەوە. ـــ ی: ڕاستپۆشی، درۆزنی.

**ڕاسپێر:** ئەو کەسەیە بە یەکێکی ڕابسپێری.

**ڕاسپێراو:** ڕاسپێر ـــ ڕاو، کەسێکە ووتەی یەکێکی بگەیەنی بە یەکێکی تر.

**ڕاسپێرراو:** ڕائەسپێر ڕاو.

**ڕاسپێرە:** ڕاسپێر ڕاو.

**ڕاسپێری:** ووتەیەکە بە یەکێکیدابنێر رێ بۆ یەکێکی تر.

**ڕاست:** ڕاس، نەستەق، قەومین، کەسێکە درۆنەکات، ڕاستاڵ، کیپ، وە ـــ هاتن: وەدی هاتن، قسەی ـــ: قسەی نەستەق، وە ـــ گێران: وەدی هێنان. دووخ، واژی خوارو خێچ، ساوی، سێخ. ئاست، بەرانبەر، ڕووکار، حاست، حەن، حەناس، کەرخ، ئازاد لە ـــ تۆدا درۆ ناکات، واتە لە بەرانبەر تۆدا درۆ ناکات. بارە، دەربارە، لە ـــ ویدا: لەبارەی ویدا. جوورە مەقامێکی کوردییە. بۆ پرسیارە: بەڕاستی، بەڕاسی، بڕاست، ڕاستە. ناقار، شوویێن. ڕاس، بێ هەڵە، دروست. لای ڕاست بەرانبەری لای چەپ، ؟دەستی ـــ، لاقی ـــ .

**ڕاستافەکری:** ئاوەڵە و وەڕاستگیر راو، ئاشکراکراو.

**ڕاستاڵ** (کە.): کەسێکە زۆر ڕاست و دروست بێ لە ووتن و کرداردا، ڕاست.

**ڕاستان:** بۆ گەلی نەدیوە واتە گەلی ڕاست، چەندکەسێکی ڕاست. زەوییەکە، کە ڕاست و بێ زورگ و هەڵەت بێ، ڕاستایی.

**ڕاستاهەڤ** (باک.): ڕاوێژ.

**ڕاستایی:** تەختایی، بێ کەندوهەڵەتی، ئاستی ڕاسی
ڕاسته
زەوی وچتی تر. گۆڕەپان، مەیدان.

**ڕاستە:** خەتکێش، ڕاستۆکە، ڕاسە، ڕاستک، ڕاستوک، دار یا ئاسنێکی ڕاستە خەتی ڕاستی پێدەکێشرێ. (ڕەوا.) زیی، خەتی نێوکاکۆڵ و پرچی شانەکراوە. وایە، وەیە، تەواوە، دروستە. دارێکی دووپەلە لە بلۆسکی ئاش دەخرێ تا بڵندی ونزمی بەرداشی پێ تاقی بکرێتەوە. جوورە هەڵپەرینێکە لاقی ڕاست پێشدەخرێ و بە لای ڕاستدا سوور دەخورێ.

**ڕاستەبێ** (کە.): ڕاست بوونەوە سەرپێیان، هەستان.

**ڕاستەڕێ:** ڕاستەوڕێ. ڕێگای ڕاستی بێ چەوتی.

**ڕاستەقانی:** ڕاسی، ڕاستی، ڕاستیەکەی.

**ڕاستەقینە:** ڕاستەکینە، ڕستیەکەی، ڕاست ودروست، چتێکە درۆ و ناڕاستی تێدانەبێ.

**ڕاستەک** (باک.): ڕاستە، دەستوور، ڕێزمان.

**ڕاستەکی:** ڕاستەوڕێ، ڕاستیەکەی.

**ڕاستەکینە:** ڕاستەقینە.

**ڕاستەوانە:** چتێکە پێچەوانە نەبێ.

**ڕاستەوەبوون:** ڕاست بوونەوە.

**ڕاستەوەکردن:** ڕاستکردنەوە.

**ڕاستەبازاڕ:** کۆڵانێکی ڕاستە ئەوبەروبەری دووکان بن.

**ڕاستەوچەپە:** جوورەیاریێکە لە هەڵووکێنیدا بەدەستی ڕاست وچەپی لێدەدرێ.

**ڕاستەوخۆ:** ڕاستەوڕێ، ڕاستەوڕاست، بێ لارەکە، هەرلەخۆوە، دەستبەجێ، سەربەخۆ، یەکسەرە، ووتە یا کردنی کارێک نیشاندەدا کە پێچ و لادانی تێدانەبێ: ـــ برۆ: واتە هیچ لامەدە. ـــ بیڵێ: واتە درۆی تێدا مەکە.

**ڕاستەوڕاست:** ڕاستەوڕێ، دەقا ودەق، ڕاستەوخۆ.

**ڕاستەوڕێ:** ڕاستەوخۆ، ڕاستەوڕاست، ڕاستەڕێ.

**ڕاست بوون:** درۆ و ناڕاستی تێدانەبوون.

**ڕاست بوونەوە:** چەوتی تێدانەمان، لەخەوتنەوە یا لەدانیشتنەوە، قیت بوونەوە،هەستان، قندربوونەوە، هەستانە هەوا، لەنەخۆشی ـــ: چاک بوونەوە، نەمانی چەوتی و لاری چت.

**ڕاست بێژ:** ڕاستکار، ڕاستگۆ. ـــ ی: ڕاستکاری، ڕاستگۆیی.

**ڕاستپۆش:** درۆزن. ـــ ی: درۆزنی، ڕاستی نەکوتن.

**ڕاستچوون** (کە.): ڕاستی ووتن، ڕێگەی ڕاست گرتن.

**ڕاسترەو:** ڕاسترۆ.

**ڕاسترۆ:** ڕاسترەو، خۆشکردار، پاکخوو، ڕاستکار. ـــ یی: ڕاسترەوی، خۆشکرداری، پاکخوویی، ڕاستکاری.

**ڕاسترۆیین:** بە ڕێگایەکیدا ڕاست چوون و لانەدان، بەکار و خود و کرداری باش ڕابواردن و ڕاست کوتن و ڕاسرۆیین.

**ڕاستک** (باک.): ڕاست، ڕەنگی خەنەی بۆبرۆیان، خەتی نێوکاکۆڵ وپرچی شانەکراو.

**ڕاستکار:** ڕاست کردار، ڕاستبێژ، ڕاستگۆ. ـــ ی: ڕاست کرداری، ڕاست بێژی.

**ڕاستکەتی:** شایان، شیاو، شایستە. (باک.) گونجان، بەرژەوەند، بەراوەرد.

**ڕاستکەرەوە:** چەوتی لابەر، کەسێکە خووارایی چتی چارەسەر بکا یا هەڵەی نووسراوان ڕاست بکاتەوە.

**ڕاستکردن:** کوتنی ئاخافتنی ڕاست.

**ڕاستکردنەوە:** خوواریو چەوتی و گێڕی چارەکردن، هەڵەبژێری، چەوتی ساخکردنەوە، هەستاندنی گیاندارلە ڕاکشانەوە بۆ دانیشتن و یا لە دانیشتنەوە بۆ سەرپێیان.

**ڕاستگا:** لای ڕاستە.

**ڕاستگۆ:** ڕاستبێژ.

**ڕاستگۆتن:** ڕاست ووتن.

**ڕاستگۆیی:** ڕاستبێژی.

**ڕاستۆ** (باک.): ڕاست، ئازاد.

**ڕاستۆک** (سوور.، ڕەوا.): ڕاستە، زیی، خەتی نێوەڕاستی پرچ وکاکۆڵی شانەکراو.

**ڕاست وچەپ** (کۆ.): زنجیر یاپەتێکە لە دەستێک یا شوویێنێکی وولاخی بەرزە دەخرێت، ئەشکێڵ. (زا.) ئاسنێکی خوواری لووتداره زەمەی تفەنگی پێ دەردەهێنرێ لە کاتێکیدا کە گیر بێ.

**ڕاست وچەپکردن:** لە سەر زگ ڕاکێشانی یەکێک، دەستی ڕاست و لاقی چەپی یا دەستی چەپ و لاقی ڕاستی لێک دەبەستن بۆ ناووک هێنانەوەی یا بۆ نەرمکردنی پشتی.

**ڕاست وڕاست:** ڕاستەوڕاست.

**ڕاست و ڕەوان:** بە ئاشکرا، بێ پەردە.

**ڕاست و رووت:** ڕاستێکی ئاشکرا، ڕاست و ڕەوان.

**ڕاستوێژ:** ڕاستبێژ. ـــ ی: ڕاستبێژی.

**ڕاستهاتن:** دیلهاتن، دینهاتن، گەیشتنە یەکتری، تووش بوون، ڕێکەوت، کار ـــ: پێکهاتن.

**ڕاستی:** ڕاسی، دروسی، بەپێچەوانەی ناڕاستی و درۆ و درۆزنی.

**ڕاستی؟بۆپرسیارە:** ئایا ڕاستە؟، بەڕاستی؟، ئایاوایە؟، ڕاستی؟.

**ڕاستێتی:** ڕاسێتی، دروسی، بە پێچەوانەی درۆزنێتی. نا ـــ : درۆزنێتی.

**ڕاسخت:** نێوی دەرمانێکییە.

**ڕاسروێین:** ڕاستڕۆیین.

**ڕاسقی:** ڕازقی، جوورە ترێیەکی سپی گلوو گەورەیە وخڕە دەنک ووردی چکۆڵەیە وە هی خەلیلی دەچی، (بابا.) سایەنی.

**ڕاسلەر:** ڕاستەر، بە پێچەوانەی چەپلەر.

**ڕاسوو** (ئەردە.): مشکی خورمایە.

**ڕاسواچ** (هەورا.): ڕاستبێژ، ڕاستی بێژ.

**ڕاسوێژ:** ڕاستبێژ، ڕاستگۆ. ـــ ی: ڕاستبێژی، ڕاستگۆیی.

**ڕاسهاتن:** ڕاستهاتن.

**ڕاسی:** ڕاستی، دروستی.

**ڕاسی ڕاستی:** بە پێچەوانەی چەپی.

**ڕاشەکان:** ڕاوەشان.

**ڕاشەکاندنی چت:** ڕاوەشاندن، تەکاندن.

**ڕاشکاندن** (باک.): ئامادە بوون یا ئامادەکردن، قایم وتوند کردن.

**ڕاشکان** (کە.): تێ پەڕین، شەق ولەت بوون، شەو ڕاشکا: شەو شەق بوو.

**ڕاشکاندن** (باک.): تێپەڕاندن.

**ڕاشکێن:** تێپەڕێن.

**ڕاشووڕووت** (ئەردە.): ڕەشوڕووت.

**ڕافران:** ڕاڕفان.

**ڕافراندن** (باک.): هەڵفڕاندن، ئاوێژتن، ڕاڕفاندن.

**ڕافڕێن:** ڕاڕفێن.

**ڕافڕین:** ڕاڕفین، بە پێی ڕاوێژەی باکوور، کە دەستەسوار و پیادەیەک پێکەوە بچنە ڕاوێ: (ڕاو) ی پێدەڵێن کە پێکەوە بچنە ڕاوەکەوێ: ناوی(هێلە)یە بەلام، کە تاقەکەسێک بچێتە ڕاوێ دەتوانیێ بڵێ ئەمز چووبوومە نێچیرێ چونکو بۆ تاکەسێک نێچیری پێدەڵێن.

**ڕاڤ** (باک.): ڕاو.

**ڕاڤە:** (باد.) شرووڤە، وەرز، گەی. ـــ کرن: وەرزین، لێکدانەوە، وەلامە، هەڵڕشتن، درێژە پێدان، لەسەر ڕۆیشتن.

**ڕاڤەکار:** وەرزێن، درێژەپێدەر، لەسەرڕۆ.

**ڕاڤەکەر:** دوونوختەی وا (:) کەلەهەر جێگایەک دیترا نیشانەی وەیە کە هی‌دوایی ڕاڤەی بەشەکەی پێشووە. ڕاڤەکار.

**ڕاڤەکرن:** وەرزین، لێکدانەوە، وەلامە، هەڵڕشتن، درێژەپێدان، لەسەر ڕۆیشتن.

**ڕاڤەتاندن:** جووێ بوونەوە، لێکهەڵبڕان.

**ڕاڤەنان:** کەوتنی درەختە بەرەگ و ڕیشەوە، بەلاربوونەوەشی دەڵێن. هەڵکەنران، لەشوێنی خۆ ئاوارەبوون.

**ڕاڤەناندن:** هەڵکەندن، ئاوارە ودەربەدەرکردن.

**ڕاک:** جوورە گۆرانییەکە.

**ڕاکاڵین:** ڕاپەڕین، بەغار ڕۆیشتن (بۆ ئاژالان).

**ڕاکەوتن** (باک.): نووستن.

**ڕاکەوەی** (هەورا.): سرەوتن.

**ڕاکەوتن:** خۆ ئامادە کردن بۆ دزین یا فڕاندنی چتێک.

**ڕاکردن** (موک.): بەزین، خاردان، غاردان، لینگدان، هەلاتن، هەڕاکردن، ڕەمین، دەرچوون، فرەکردن، خۆ هەڵخستنی بەرگی شۆڕاو و دەغڵی تەڕ، ـــ ی با: هەڵکردنی بایە. ڕێگرتن، ڕێ بڕین، ملی ڕێگاگرتن.

**ڕاکرن** (شەم.): هەڵستاندن، هەڵساندن، هەستاندن. (باک.) هەڵگرتن، بڵندکردن، وەئاگاهێنان. (باد.) لابردن. خانەنشین کردن، لە فەرمانی دەوڵەتی دوورخستنەوە.

**ڕاکرن و دانین** (باک.): دەستەلاتداری و دەستڕۆیشتن.

**ڕاکشان:** درێژبوون، تووتەوتلۆربوون، تخێل بوون، ڕۆکەوتن، پاڵکەوتن.

**ڕاکشاندن:** ڕاکێشان، کێشان، پاڵخستن.

**ڕاکشاو:** پاڵکەوتوو. گیان لەبەری درێژی بالابەرز.

**ڕاکوتان** (باک.): لەحیم کردن، جەمسەری دوو یا چەند چتان گەیاندنەوەیەک بە دروومان یا لەحیم.

**ڕاکوشان:** کوشین.

**ڕاکوشێن:** کوشێن.

**ڕاکوشین:** ووشین، گوشین.

**ڕاکێشان:** کێشهاتن، ڕاکشاندن، کێشان بە زۆر، خۆ ـــ: ڕاکشان.

**ڕاکێشاندن** (باک.): هەڵگرتن؛ بارام کچا فەرهاد ڕاکشاند: بارام کچی فەرهادی هەڵگرت.

**ڕاکێشران:** کێشران، هەڵگیران.

**ڕاگە:** لالەزان. (کە.) ڕێگا، (هەورا.) جێگای ڕێ.

**ڕاگەڕاندن:** لە ناوداگەران، تێگەڕاندن.

**ڕاگەش** (باک.): توورە، قەڵس، سەرگەرم. ـــ ی: توورەیی، سەرگەرمی.

**ڕاگەیاندن:** ئاگادارکردن، وەلام دان، پێڕاگەیاندن. پێ ـــ: پەروەردەکردن، پێ گەیاندن.

**ڕاگەیشتن:** پێ گەیشتن، بە چتێک گەیشتن.

**ڕاگەیێن:** پێڕاگەیێن، وەلامدەر، ئاگادەر، (باک.) باخڕ، کەسێک دەنگ و باس بلاو بکاتەوە.

**ڕاگەیین:** پێڕاگەیشتن، بەسەر ڕاگەیشتن.

**ڕاگر:** سەرۆکی خێزان، سەرۆکی زانستگا. پارێزەر، پاژەر، پشتیوان، چتێکە هۆی وێستانی چتێکی تربێ.

**ڕاگرتن:** ڤەچڤاندن، ڕاوەستاندن، بەندکردنی چت یاکەس لە سەر ڕێگا. بە خێوکردن، پەروەردەکردن. پەکخستن، دوواخستن، بەند. دەست یا پێ ئازاری پێ بگا، لە جوولانی دەخا دەڵێن دەستی ڕاگیراوە.

**ڕاگوزار:** ڕێگایەکە هات و چۆی بە سەردا بکرێ.

**ڕاگوزەر:** ڕاگوزار، ڕێبووار، ڕێ بگار.

**ڕاگوزەراو:** ڕێگە ئاو، دەراو.

**ڕاگۆستن:** ڕاگوێزتن، گوێزتنەوە.

**ڕاگوشێن:** ڕاکوشێن، بکوش.

**ڕاگوشین:** ڕاگوشین، کوشین.

**ڕاگومکێ:** لادان، پشت لە ڕاستی کردن، خۆلێ هەڵەکردن، خۆ نەزانکردن.

**ڕاگووێزەر:** گووێزەرەوە، ڕاگوێزەرەوە.

**ڕاگووێزەرەوە:** ڕاگوێزەر.

**ڕاگووێزتن:** ڕاگۆستن، گووێزتنەوە.

**ڕاگیر:** ڕاگر، پایەدار، گیر، ڕاوگیر، بەند، پەک. ـــ بوون: پایەداربوون، مانەوە، بەندبوون. ـــ کردن: پایەدارکردن، گیروەحتەل کردن، ڕاگرتن.

**ڕاگیران:** پەروەردەکران، وەرگیرانی نێرینە یامێینە بۆ نۆکەری وکارەکەری وە یا ڕاگیرانی ئاژاڵ و ڕەشەوولاخ بۆ قاوورمە. ـــ ی دەست وپێ، لە جێ چوون، لەکارکەوتن.

**ڕاگیراو:** پارێزراوە، بەخێوکراوە. بەندکراو. پەککراو. ڕاوەستێندراو. دەست یا پێ یاقامکەکانەکە ئازاریان دیتبێ. ـــ ی: پارێزگاری، پایەداری.

**ڕاڵێ بوون:** پەسەندکردن.

**ڕام:** محاڵ و پارچە خاکێکی کوردانە لە وولاتی فارساندا وەکو ڕامهۆرمز، ڕام ئەحمەد. (ئەردە.) گوورروو، دەستە مۆ، خەرۆ، کەوی، ڕاهاتوو، ئۆگر، هۆگر، ملکەچ، کەمۆ، خوولین. ـــ بوون: کەوی بوون، ڕاهاتن، خووگرتن. ـــ کردن: کەوی کردن، دەستەمۆکردن، ڕاهێنان، لێنی کردن.

**ڕاماڵ:** تار، تارەدووا، تەرەدووا، ڕاپێچ.

**ڕاماڵان:** ڕاپێچەکدان، دوورخستنەوە، گسک لێدان.

**ڕاماڵبوون:** ڕاپێچ بوونی قوڕولیتە، ڕافڕاندنی گیاندار.

**ڕاماڵدان:** ڕاماڵین، ڕاپێچەکدان، ڕاپێچان، ڕاپێچدان، گسک دان.

**ڕاماڵکردن:** ڕاپێچکردنی قوڕ و لیتە و ڕادانی لە سەر زەوی، ڕافڕاندنی گیاندار.

**ڕاماڵنیان:** ڕاماڵدان.

**ڕاماڵێن:** ڕاپێچەکەر، گسک لێدەر.

**ڕاماڵین:** ڕاماڵدان، ڕاماڵکردن.

**ڕامان:** هێنانە پێش چاو، پۆنجین، ئەندێشە کردن، بیرکردنەوە لە چتێک، بیرلێکردنەوە. تەماشاکردن. بیر.

**ڕاماندن:** کەسێکی خستنە ئەندیشە و بیرکردنەوە.

**ڕاماو:** تەماشاکار، سەرەنج دەر، بیرکەرەوە، کەسێکەبێ دەنگ بووبێ و بیر لە چتێک بکاتەوە.

**ڕامە** (ئەردە.): ڕاوکە.

**ڕامەزاندن** (باک.): ڕامداندن.

**ڕامبوون:** ڕاهاتن، هۆگربوون.

**ڕامداندن** (باک.): ڕامەزاندن، ڕاخستن، پانکردنەوە.

**ڕامدین:** ڕاخران، پانکران.

**ڕامشگەر:** ئامۆژگار، (هەورا.) مۆژ یاری کار.

**ڕامکە:** ڕاوکە.

**ڕامکردن:** ڕاهێنانی گیاندار بە چتێک، گرۆکردن، لێنی کردن، ئارام و هێدی کردن، نەرمکردن.

**ڕاملخستن:** ڕێگا خستنەمل، بەڕێ کردن.

**ڕامووز** (باد.): ماچ، ڕامووژ.

**ڕامووس** (باک.): ماچ.

**ڕامووسان** (باک.): ماچکردن.

**ڕامووساندن** (باک.): ماچکردن.

**ڕامووسێن:** ماچکار.

**ڕامووسین:** ماچکردن، ڕامیسان.

**ڕامهۆرمز:** پارچە خاکێکی کوردانە لە وولاتی فارس.

**ڕامێن:** بڕامان، تەماشاکار، ئەوکەسەیە تەماشا دەکات.

**ڕامی:** دەستەمۆیی، کەمۆیی، هۆگری، ئۆگری.

**ڕامیار** (هەورا.): سیاسی. ـــ ی: سیاسەت.

**ڕامینان** (باد.): ڕووانین، تەماشاکردن.

**ڕان** (موک.، کە.، بابا.): (باک.) ڕەهن، (باک.) ئێت، کاماخ، هێت، بەشێکی زۆر ئەستوورە لەلاق لە نێوانی ئەژنۆ و سمتدا، بە ـــ ی خۆدادان: پەرۆشبوون. (دەر.، کە.، جا.، هەورا.) مێگەل، گەلەی بزن و مەڕان.

**ڕانـان** (دەر.): ئاژۆتن، لێخوڕین، ڕاونـان، خـۆ ـــ: خۆنووانـدن، خۆنیشاندان.

**ڕاناندن** (دەر.): لێخوڕین، ئاژۆتن.

**ڕاناو:** بەرناڤ.

**ڕانە:** ڕانک.

**ڕانەکی:** پاڵوو، پاڵدو.

**ڕانەرم** (باک.): بەتام، خۆش، ناسک، ڕازاڤ.

**ڕانەرمی:** بەتامی، خۆشی ڕازراڤی، ناسکی.

**ڕاندن:** لێخوڕین. دەرباز کردن، ڕزگارکردن.

**ڕانڕادان:** مێگەل ئاژۆتن.

**ڕانک:** شاڵ، (هەورا.) ڕۆنکی، (هەر.) ڕانی، (کە.، زێ.، بار.) پەشمە، پانتۆڵێکە لە بووزوو دروستدەکرێ و لە سەر دەرپێوە دەپۆشرێ.

**ڕانکە** (کە.): ئەو کەمە تووکەیەکە لەسەر پشتی بزنان دەهێڵرێتەوە تا لەگەرمای بپارێزێ، پشتەک. (بابا.) مووی لاڕانی بزنانە، کە بەهاران دووای بڕینەوەی ئاژاڵان دەهێڵرێتەوە تادڕوو لە گووانی نەدات.

**ڕانک و چۆغە:** شاڵ و شەپک، شەلە و شەپک، (سور.) ڕانک و چۆغەڵ، ڕانی و بەرگووز.

**ڕانکی:** بڕوانە: ڕانەکی.

**ڕانما:** ڕابەر، ڕێ نما، ڕێگەنووێن. ـــ یی: ڕابەری.

**ڕانموون:** ڕێگانیشاندان. ـــ ی: ڕابەری، ڕێبەری.

**ڕانن** (کە.): ڕاندن، ئاژۆتن، ڕاوان.

**ڕانووانـدن:** چت نیشـانی خـەڵکی دان. مێگـەل لـە بـێردان، نووانـدن، (هەورا.) ڕانووانەدەی.

**ڕانووێن:** نیشاندەر، نووێن.

**ڕانی** (هەو. باد.): ڕانک.

**ڕانیە:** دێیەکە کەوتۆتە لای باکووری شاری کۆیە و دەشتی بیتوێنیێ.

**ڕانین** (جا. باک.): لێخوڕین، تاژۆتن، (باک.) ڕادان.

**ڕانی و بەرگووز:** ڕانک و چۆغە.

**ڕاو:** نەچیر، وەدووی نیچیران کەوتنە بۆ گرتن یا کوژتنی لە وشکانی یا لە ئاوێدا. ـــ کردن: خەریکی نێچیر گرتن بوون. (جۆلە.) حەیرانە، لاووک. (هەو.) دەردێکە لەکاتی زانێدا لە ژنان پەیدادەبێ، هەر ژنێکی بیگرێ چرچ دەبێ. فێڵ، تەڵەکە، کەڵک، ڕیو.

**ڕاوار** (ئەردە.): خۆشڕەوت، خۆشڕۆ.

**ڕاوارتن** (باک.): گوویزتنەوە، ڕاوێرە: بگوویزەوە.

**ڕاوئاسنی** (هەورا.): ڕێگای ئاسنی.

**ڕاوەدوونان:** ڕاونان.

**ڕاوەڕاوە:** ڕاونانی گیاندار کەمکەمە بۆ گرتنی یا دەرکردنی.

**ڕاوەڕێوی:** ڕاوی ڕێوی، مەبەس لەپێچ و پەنا هێنانەوەیە لەکاروباردا. تەڵەکە وکەڵک، فێڵ وفەرەج.

**ڕاوەست** (باک.): ڕاوەستە، دەست ڕاگرە.

**ڕاوەستان:** بەپێوە وەستان، وێستان، (هەورا.) مەدرای، مدرایرە، ئەرەمداری، ئەرەمەندی، (فە.) ووسان، ووسین. مەدران، تەرتەڵە، وەستان، بۆ مرۆڤ و چتی تر. چک، ووشک. ـــی دڵۆپە: چک بوون، ووشکبوون. وێستان و نە جوولان. ـــی ئاو: پەنگاو خواردنەوە. دەست لە کار هەڵگرتن، یا نە نووسین یا نە دووان. لەجووڵە کەوتنی هەندێ چت.

**ڕاوەستاندن:** وێستاندن، بە پێوە ڕاگیر کردن، لە جووڵە خستنی چت.

**ڕاوەستاو:** وێستاو، بە پێوە ڕاوەستاو، تێک، دا لەواژ. بۆ ئاو: ئاوێکە پەنگاوی خواردبێتەوە و نەڕوات. پایەدار، بێ لەبت، فرشک، بێ جووڵە ـــ بوون: پایەداربوون. ـــ کردن: پایەدار کردن. ـــی: پایەداری.

**ڕاوەستە:** بووێسە، بێسە، بووەسە.

**ڕاوەشان:** جقجقین، ڕاتڵەکان، ڕاتەکان.

**ڕاوەشاندن** (باک.): ڕاتڵەکاندن، ڕاتەکاندن، وەشاندن، تەکاندنی بەرە ومافوورە و ئیتر، هڵبەشاندن، مەراندن، جوولاندن، بزواندن، جقجقاندن، جوولاندنەوەی چتێک بەتوندی. گجگجاندن.

**ڕاوەشێن:** ڕاوەشێنەر.

**ڕاوەشێنەر:** ڕاوەشێن، داتەکێنەر، ڕاتەکێنەر.

**ڕاوەک** (کۆ.): ڕاوۆک، تۆڕاخدان، توورەکەیەکە ترێی تێدا دەکوشن بۆ دۆشاو. کیسەی پەنیرو لۆرک، توورەکەی دۆیە.

**ڕاوەکان:** جوورە ڕاوە کەوتێکە لەسەر کانی دەکرێ سەر لە بەیانی و ئێواران کە پەلەوەر و زیندەوەران دێنە سەر کانی بۆ ئاو خواردنەوە.

**ڕاوەکەو:** کەوبازی، (باک.) هێلە.

**ڕاوەند:** گیایەکە بۆ ڕەوانی و هێزی چیکڵدانە باشە، (هەورا.) ڕەگەریواوی.

**ڕاوەندی چینی:** ڕەگەریواوی چینی.

**ڕاوبان:** (کە. باز. زەن.): ڕێگاوبان، ڕێ و بان.

**ڕاوچی:** ڕاوکەر، کەسێکە لە هونەری ڕاوێدا شارەزابێ و ڕاوێ بکات، شکارچی، نێچیرەوان.

**ڕاوچێتی:** ڕاوکەری.

**ڕاوور** (باک.): سوورفل، دەهبەر، سوورفش، ڕەنگێکە لە نێوان سوور و زەردیدایە، هۆل، سووری شڵە، شلێ، شێ، خەنەیی ڕەنگ، سووروهول.

**ڕاووشکا** (ئەردە.): شێنەیی، ئاسوودەگەری.

**ڕاوکە:** مارە، ڕاوە، (کە.) فالێ، مووتاوا، (دەر.) مووتاوە، هێلکەیەکە بۆ مریشک دادەنرێ تا لەسەری هەڵنیشێ کە هێلکەی لە تەنیشت بکات. کولانەی مریشکان.

**ڕاوکەدۆزی** (کۆ.): هەوڵ و تەقەلای باڵندانە بۆ دۆزینەوەی ڕاوکە، (موک.) داوەلۆزە.

**ڕاوکەر:** نێچیرەوان، نێچیرڤان، ڕاوچی. بۆ نێرینە و مێیینەیەکیش بەکاردەبرێ کە حەز لێکردوویی بکەن، چاوباز.

**ڕاوکەری کەوان:** کەوباز.

**ڕاوکەری ماسیان:** ماسیەوان، ماسیڤان.

**ڕاوکردن:** نێچیرەوانی کردن، نێچیر گرتن لە ناو ئاو یا لە ووشکانیدا.

**ڕاوگە:** جێگاو شوێنی تایبەتی ڕاوێیە. شوێنێکە بە نهێنی لە نێوانی دوو دەزگیراناندا دیاری کرابێ.

**ڕاوگیر:** ڕاگیر.

**ڕاوناس:** ڕاوزان، ئاشنای ڕاو. ـــی: ڕاوزانی، ئاشنایی ڕاوێ.

**ڕاونان:** سەر لە دوونان، ڤەکشکشاندن، ڕاڕڤاندن، ڕەپێ نان، هەڵبرین، (هەورا.) ئارنان. (کە.) تاونان، ڕفاندن. دوژمن شکاندن.

**ڕاونەر:** ڕاڕفێنەر.

**ڕاونراو:** سەر لە دوونراو، تارنراو.

**ڕاونێر:** ڕاونەر، ڕاونێن، ڕەپێ نەر.

**ڕاونێن:** ڕفێنەر، ڕەپێ نەر، ڕاونێر، ڕاونەر. کەشتی شەڕێ.

**ڕاونیان** (ئەردە.): ڕاونان، ڕاماڵنیان، تارەدووانیان، تارنیان.

**ڕاووڕوو:** ماستاوکردن، مەرایی کردن، خووەلێ دانین، دەڵەچەکی، (ئەردە.) ڕووپامایی.

**ڕاووڕووت:** ڕووتکردنەوەی مەردوم لە لایەن ڕێگر یا جەردەوە بە زۆری، جەردەیی، گووێ بڕی. ـــ کردن: جەردەیی کردن.

**ڕاووڕێس:** ڕایەڵ و ڕیسی چتی تەنراوە، ئەم بەڕەیە ـــێکی جووانی هەیە.

**ڕاووڕیو** (ئەردە.): کەڵەک و فێڵ، شێوە وکەڵەک، داوو حوقە.

**ڕاووک** (هەو.): توورەکەی تۆڕاخ و ئیتر، تۆڕاخدان، ڕاوەک.

**ڕاووک:** توورەکەیەکی شاڵینە، دەنکەترێ و یا هەناری تێدەکرێ و لەسەر کۆلیت دادەنرێ و بە پێ دەشێلرێ تا ئاوەکەی بگیرێ هی ترێیەکە دەکرێتە دۆشاو، هی هەنارەکەش دەکرێ بە رووبی هەناری.

**ڕاووگ:** ڕاووک.

**ڕاویار** (ژاوە.): ڕێبووار، ڕاوچی، ڕێبگار. ـــی: ڕێبوواری، ڕاوچێتی.

**ڕاویەر** (هەورا.): ڕاڕەو، ڕێبووار.

**ڕاوێچکە** (کە.): بەهەڕاکردن و غاردانی کەروێشک بە تایبەتی لە هاتوچۆیەدا. (کە.) ڕاوێشکە. هاتوچۆ کردن، بیرکردنەوە لە چتێک.

**ڕاوێژ:** تەگبیر، مشوور، لێکدانەوەی ئەنجامی کارێک لەگەڵ یەکێکی، بیرکردنەوە لە چتێک. بە تەخمین بۆ چوون. نکتە، بیر، بیروباوەڕ، بیرورا.

**ڕاوێژەر:** کەسێکە تەگبیری لەگەڵ بکرێت.

**ڕاوێژکار:** ڕاوێژکەر. ـــ ی: ڕاوێژگەری.

**ڕاوێژکردن:** تەگبیرکردن، لێ وورد بوونەوە.

**ڕاوێژگا:** تەگبیرگا.

**ڕاوێژگە:** تەگبیرگە.

**ڕاوێژیار:** ڕاوێژەر. ـــ ی: ڕاوێژەری.

**ڕاوێستان:** ڕاوەستان.

**ڕاوێستاندن:** ڕاوەستاندن.

**ڕاوێستاو:** ڕاوەستاو.

**ڕاوێشک:** ڕاوێچک.

**ڕاوێشکە:** ڕاوێچکە.

**ڕاوێشکردن** (ئەردە.): دەورەی نێچیرگرتن.

**ڕاوی:** تووله و تاجی و باڵندەیە، کە ڕاویان پێ بکرێ، ڕاوکەر. (هەورا.) ڕەواقی هەنگوینی، شیرەی هەموو شلەمەنییە کییە.

**ڕاوین** (فە.): ڕاوکەر.

**ڕاه:** ڕێگا.

**ڕاهاتن:** فێربوون، چێربوون، چەشبوون، چەشەخۆرەبوون، ژێهاتن، هۆگربوون، پرەنگین، ڕام بوون، ئۆگربوون، چارشابوون، ئاشنابوون. لێ ـــ: خوو پێگرتن، پێ فێر بوون، ترس شکان.

**ڕاهاتوو:** ترس شکاو، ڕام، ژێ هاتی، چارشا، (خۆ.) متۆ، گیاندارێکە هۆگر بووبێ.

**ڕاهانین:** ڕاهێنان.

**ڕاهەژاندن** (باک.): جووڵاندن، هەژاندن، ڕاتەکاندن.

**ڕاهشتن**(باک.): ڕیشەکەنکردن، لەڕیشە هەڵکەندن، لابردن.

**ڕاهشتن هەڤ** (باک.): پیلەگرتن، شەڕوکێشەکردن، پەلاماردانی چتێک.

**ڕاهوار:** ڕادار.

**ڕاهێشتن:** بانگ ـــ: بانگ دان، جاڕدان. ترکەندن، زرت کێشان، ڕۆهیشتن و درێژبوونی چووی یەکسم و گوێدرێژ و ئیستر. ڕایەڵکردن، ڕاچاندنی پیس و گوریس. ئامادەکردنی منداڵی ساوا بۆ میز و گوو کردن.

**ڕاهێلان:** ڕاهێشتن.

**ڕاهێڵ بوون:** ڕەهێڵ بوون.

**ڕاهێڵ کردن:** ڕەهێڵ کردن.

**ڕاهێن:** ڕاهێنەر، فێرکەر.

**ڕاهێنان:** چێرکردن، چەشکردن، چەشەخۆرە کردن، فێرکردن، داهێنان، ڕامکردن، هۆگرکردن، پرەنگاندن. داهێنان، دادرین. لێ ـــ: دادڕینی چتێکی سەرانسەر. هەوری ڕاهێنا: هەوری داهێنا.

**ڕاهێنەر:** هۆگرکار، ڕامکار، چەشەکار.

**ڕاهی** (کە.): فراوان، گوشاد، ڕایی. ـــ بوون: ڕایی بوون، ئازاد بوون، بەرەڵا و سەربەست بوون.

**ڕای** (لو.): بۆ، لۆ. (باک.) یەکێتی، نیشان، پارێزگاری. ـــ کرن: نیشاندان. ڕا، بیرورا.

**ڕایاخ** (کە.): ڕایەخ.

**ڕایە:** (بابا.) تووان، شیاو، دەستەڵات، ووزە، لە بارەی ئاخوتن یا کردارێکەوە؛ کەس ـ نیە لە ڕاست تۆدا بە گومان بێ، یا ووشەیەکی نا پەسند بڵێ.

**ڕایەت:** ناوی دێیەکییە لە نزیک زینووی شێخییە.

**ڕایەخ:** (دزە.) ڕایاخ، ڕایێخ.

**ڕایەکەوتن:** لە تووانادابوون، شیان، لە دەستەڵات و ووزە دا بوون. بێگانە ڕایەی ناکەوێ بە چاوی سووک تەماشای کوردان بکات.

**ڕایەڵ:** تان، ڕایێڵ، چەند هەودایەکی ڕاستە کە پۆی چتی لەسەر دەتەنرێ. ـــ کردن: ڕائەنگاوتن، ڕاچاندن، ڕاهێشتن، ڕستە یا تەناف هەڵخستن.

**ڕایەل:** دارەڕا.

**ڕایەڵە** (ئەردە.): ڕایەڵکە.

**ڕایەڵکە:** ڕاوێچکە.

**ڕایەڵکردن:** هەودا کردنە ڕایەڵ. داری دارەڕایە بەسەر دیوارانەدا ڕایەڵکردن.

**ڕایەت** (ڕایەت): پارچەخاکێکی کوردستانەلە باکووری نسیبینێیە چەند گوندێک و ئاواییێکیشی تێدایە.

**ڕایج** (کە.): بێ هێز، بەرنەگر، چتی خراپ و ناپەسند: زیوەکە یا کرەکە ڕایجە.

**ڕایخ:** ژێرەخەر.

**ڕایگەم** (هەورا.): هەموو، گشت.

**ڕایێخ** (باک.): شەلت، شەلتە، ژێر ڕایێخ، (دزە.) ڕایەخ، (کە.) ڕایاخ.

**ڕایێخەر:** ڕاخەر.

**ڕایێخستن:** ڕاخستن، داخستن.

**ڕایێڵ:** هەڵخستن، ڕایەڵ، تان، جۆڵا ـــ ی کرد: ڕایچاندووە.

**ڕایێلە:** بۆ ئەندازەییێکی دیاری کراو بەکاردەبرێ، بۆ پێوانی دانەوێڵە وەکو: وەزنە، تەغار، مەن، پووت، کەویژ (کەویچ).

**ڕایی** (ئەردە.): ئازاد، سەربەست، بەردراو، ڕێبوار، ئەوەیە، کە خرابێتە ڕێ. ـ بوون: جێ بە جێ بوون، نەمانی بەرهەڵست. ـــ کردن: جێ بەجێ کردن، بەڕێکردن، نەهێشتنی بەرهەڵست.

**ڕایی ڕایی:** ڕاڕا، بەدگومان، دوودڵ، هەردەم بیر، (ئەردە.) هۆکێ.

**ڕە:** لە: ڕەگەڵخستن، لەگەڵناردن. (باک.) ڕەگ.

**ڕەئین** (باک.): وەڕینی سەگییە، عەوعەو.

**ڕەباس** (خۆ.): ئاوەنیا، زەوی تێراو، (هەورا.) ڕەپستە، پاراو. دەغڵی بەراو، بۆ شینایی و زەوی تێر ئاو بەکاردەبرێ.

**رەبەت:** کۆلیت. حەشارگەی راوکەرانە بۆ نێچیران، ناوی دێیەکیشە لە ناوچەی قەرەداغ، کە نزیکی شاری سلێمانییە.

**رەبەق** (رەوا.، هەو.): تەواو، بێ کەم و کووڕی، بێ کەم و کورتی؛ ئەوە دە ڕۆژی رەبەقە چاوەڕێی نامەی داماوی موکریانیم.

**رەبەن** (باک.): رەبەنۆک، زوگورت، هەژار، سەڵت، تاک، تەنیا، بێ ژن و منداڵ. عەقداڵ، بێوە پیاگ. بێ ماڵ، هژار، بێ نەوا، دەستکورت، ئاوارە، دەربەدەر.

**رەبەنگ** (گەرد.): رێواسی قوڵەبنە، کەگەڵای پێوەیە، (ئەرگو.) شاوێری.

**رەبەنۆک** (رەوا.): گیایەکی کێوییە دەخورێ: بەرەزا. (هەورا.) بێ ژن، سەڵت، رەبەن.

**رەبەنی:** زوگوورتی، سەڵتی، تەنهایی، تەنیایی، بێژن و منداڵی.

**رەبساندن** (باک.): کۆ ماکردن، کۆ کردنەوە، رپسینە: کۆماکە.

**رەبسین** (باک.): کۆما بوون، کۆبوونەوە.

**رەبناک:** سۆتکە.

**رەبیت:** گیاندار یا گیایەکە، کە خێرا پێ بگات.

**رەپ:** قیت، راست، رەق، ووشک، سەخت. ـــ بوون: قیت بوون، هەستان، راستبوونەوە، یەرەق بوون. ـــ کردن: قیت و قوتکردنەوە، هەستاندن، راستکردنەوە، یەرەقکردن. تەپ، دەنگی لێدانێیە.

**رەپاش:** لە پاش، بەرەودوواوە.

**رەپال:** چتمەکی کۆنی دراو.

**رەپاندن** (باک.): چووارناڵە پێکردن، برەپێنە: چووار ناڵەی بە وولاخەکەی بکە. کوتان، لێدان، تەپە هەستاندن لەچتێک بە دەست پێدادانی. خۆ تۆ قورئانت رەپاند کە درۆ نەکەی.

**رەپان:** رەپاندن.

**رەپاوڕەپ:** برێتییە لە ووتنی چت بە بێ پەردە.

**رەپە:** تەپە، خرپە، خورپە.

**رەپەرەپ:** تەپەتەپ، دەنگی پێیانە لە رۆیشتنی بەتالووکەدا یا لە هەڵپەڕین و یا لە سەربانانداو یا هی لێدانێیە.

**رەپەکە** (خۆ.): بێ هێز، بۆ شیناوەردی، رەپکە، هەر شینایێک بێ هێز بێ ـــ ی پێدەڵێن. ـــ بوون: بێ هێز بوون.

**رەپەڵ:** بروانە: رەپەڵە.

**رەپەڵە** (ئەردە.): دەستەیەکە لە یاری کەران، (باک.) رەپەڵ.

**رەپەڵگا:** جێگای یاری، رەپێڵگە، یاریگە. بەرەلاّ، پاوانی بەرەلاّ.

**رەپەن** (باک.): پاوان، لە وەرگەی ووشک، چیمەن و کێڵگەی ووشک.

**رەپ بوون:** ئێرەق بوونی کیر، ئاوسانی لەش بە جۆرێکی وا، کە گرێ و قۆرتی تێدا نەمێنێ.

**رەپڕەپ** (باک.): رەپەرەپ، تەپەتەپ، دەنگی پێیان یا هی لێدانییە.

**رەپڕەپان:** تەپتەپە، تەپەتەپکردن: تەپتەپەکردن.

**رەپکردن:** ئێرەق کردن.

**رەپستە** (موک.، بل.): (هەو.) رەباس، پاراو، کۆلەبەس، ئاوەنیا، بەراو، بۆوونەد. دەغڵێکی بەراوە لە پاییزاندا دەچێنرێ و شین دەبێ. دەغڵێکیشە پایزان بچێنرێ بە ئاودان یا بە ئاوی بارانەی شین بێ.

**رەپسین** (باک.): باش نەکوڵان، پوخت نەبوون، برسکان.

**رەپکە** (کۆ.): پنە. (دزە.) شینایی گەنم و جۆیە لە زەوی بێتیندا، کە ئاوی زۆر لێ بێ یەک لک هەڵدەچێ و پنج دانا کوتێ. بێ هێز، بێ تین. ـــ بوون: بێ هێز بوون. ـــ کردن: بێ هێز کردن.

**رەپەڵ** (ئەردە.): رەپەڵە، دەستە، کۆمەڵە، کۆ، چینی گەمە و قومارکەران.

**رەپن:** زوورگ.

**رەپ و راست:** قیت و رەق راوەستاو.

**رەپێچەک:** قولە پێچ. ـــ دان: بە خۆشی و ناخۆشی بردن، قوڵە پێچ کردن.

**رەپێش:** وەپێش. ـــ بوون: وەپێشکەوتن. ـــ خستن: وەپێشخستن، پاڵ پێوەنان بۆ پێشەوە، خۆ ـــ خۆ خستنەپێشەوە، خۆ بردنە پێشەوە، خۆرەپێشکردن. ـــ کردن: وەپێشخستن، رەپێشخستن.

**رەپێڵگە:** رێگایەکە، کە هاتووچۆی زۆر پێدا کرابێ.

**رەپێنان:** راونان، رەتاندن، هەڵبرین، تارنان، وەدووکەوتن، سەر لە دوونان.

**رەپێنەر:** راونەر، روانێن.

**رەت:** نووچ، سەرسم. ـــ بردن: سەرسەمدان. بیر، ئەندێشە، گەمەک، لێ تێکدان. قووڵکە، چاڵ، بنەرەت. (هەورا.، رۆژ.) تەپکە، جووری تەڵەیەکە بۆ کەو گرتن و نێتر بەکاردەبرێ. داوێکە لەسەر چاڵێکی دەنرێتەوە، کە نێچیری بەسەردا رۆیشت تێدەکەوێ و زاری چاڵەکەش دەبەسترێ. تێپەڕ، لەدوو، دارەکەی بۆ ئەملایە. ـــ کە: تێپەڕێنە، لەدووی بدە.

**رەتان:** ماندوو بوون لە بەر زۆر غاردانێ. غاردان، بەزین، تەڕات، تووروق. ـــ دن: تەقاندن، رەواندن، تەقە تێخستن، راونان، رەپێنان، سەر لە دوونان، هێنان و بردن و ماندوو کردن. ـــ ن: رەتاندن.

**رەتاو:** کەسێکە یا گیاندارێکە لەبەر زۆر هاتووچۆیە و هێنان و بردنێ ماندوو بوو بێ.

**رەتەوە** (ئەردە.): بنەچە، بنە چەکە، رەسەن نامە، ریشە.

**رەتەوی** (ئەردە.): بەرخێکە تەمەنی لە نێوانی کاووڕ و شەکیدابێ، کاووڕ.

**رەت بردن:** رەتدان، بەلاداهاتن، نووچبردنی گیاندار.

**رەت بڵاو:** بیر بڵاو، نیگەران، پەرێشان، پەشێواو. ـــ بوون: بیربڵاوبوون. ـــ ی: بیربڵاوی، نیگەرانی.

**رەت بوون** (موک.): تێپەڕین، (هەورا.) ویاران.

**رەتدان:** بەلاداهاتن، رەت بردن.

**رەتکردن:** تێپەڕاندنی چتێک لە شوێنێکدا.

**رەتل** (باک.): گون.

**رەتم** (باک.): رەمڵ، خیزی زۆر وورد. تەڵە، یا فێڵێکی سازکراوە بۆ کوژتن یا بۆ رووتکردنی کەسێکی. قومەقوم، کەڵەک.

**رەتماندن** (باک.): ئاخنینەوەی زاری چتێکییە.

**ڕەتیاگ**: ڕەتاو، (ئەردە.) ترووقیاگ، مانیاگ، ماندوو، شەکەت.

**ڕەتیان** (ئەردە.): ڕەتین، ترووقیان، مانیان، غاردان، ماندووبوون.

**ڕەتیماندن** (زا.): پڕکردنەوەی چاڵ بە قوڕ و چتی تر.

**ڕەتین**: ڕەتان.

**ڕەجاڵ**: ڕووت، بێ سەروسامان، هەژار، دەستکورت. بێکەس و بێدەر. ــــ ی: بێ نەوایی، هەژاری.

**ڕەجڵ**: شایان، شیاو، وەشانەوە، ئەو کارە ــــ ی تۆ نییە: لە تۆ ناوەشێتەوە (بەڵام هەر لە نەبوونێدا بەکاردەبرێ.).

**ڕەجۆ**: ناوی شارێکی کوردانە لە چیاکرمانج لە باکووری شاری حەڵەبێیە.

**ڕەجووا**: رجوا.

**ڕەجووان** (زا.): وولاّخی ڕەوان.

**ڕەچاو**: قرم. ــــ کردن: چاوتێ برین، قرم لێخۆشکردن، ڕاچاندن، پشت پێ بەستن. ــــ گرتن: چاو تێبڕین، بەرچاو گرتن، بە هەویابوون.

**ڕەچە** (موک.): باریکەڕێ، ڕێگای زۆر باریک و تەنگەبەر لە ووشکانی یا لە ناو بەفرێدا، ڕچە.

**ڕەچەڵەک**: نەژاد، مەحسنەک، ڕەگەز، دەووڵ، ڕەسەن، ڕیچەڵۆک، هەڵە کارین. بنە چەکە، ڕەگ و ڕیشە.

**ڕەچەڵەکبڕ**: لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنەر.

**ڕچەڵەکبراو**: لە ڕەگ و ڕیشە دەرهاتوو، بێکەس، کەس و کار نەماو.

**ڕەچەڵەکبڕی**: لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنان.

**ڕەچەڵەکناس**: ڕەگەزناس، کەسێکە بنەچەکەی مرۆی بناسێ. ــــ ی: ڕەگەزناسی.

**ڕەحەتی**: کووفک، گۆفک، کووکە، تەکاو، ماستەک، (باد.) دەرمەشک. (ڕەوا.) هەوەڵبەری هەنجیبرییە، کە دەیوەرێنێ.

**ڕەحت** (زا.): ماندوو. (باد.) ــــ ی ماندوویێتی.

**ڕەحمی**: عەبدول ڕەحیم ڕەحمی ناوی هەستیارێکی کوردە لە پێش چەند ساڵێکیدا لە ئاستانە کۆچی دوایی کردووە و دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری ئەو چاپی کردووە.

**ڕەخ** (باک.): قەراخی چتی، لا، کن، نک، کەنار، تەنیشت. ــــ هەڤ: تەنیشت یەکتری، دڤی ــــ ی دا ئەم بەر یا وی ڕەخی: ئەو بەر. ڕوخی شەترەنج.

**ڕەخت**: خشڵی زێوینە لە ملی وولاّخی بەرزە و یا بە زینیدا دەکرێ. خشڵ بۆ ئافرەتان و وولاّخی بەرزە، ڕەخش. (هەورا.، جا.، ڕۆژ.) تەدارەکی مردووانە. ــــ کردن: ئامادە کردن و شوشتن و کفن کردن و ناژتنی مردووانە. (باک.) فیشەکدان. چتی ساخ و تۆکمە. ــــ ە: ڕێک و پێک، ناوونجی، دەستە. قایم، پتەو. قورس، قاب و مسی ــــ : قورس و بە جەم.

**ڕەختخاو**: پێخەو، نووێن.

**ڕەختی خەو**: پێخەو، نووێن.

**ڕەخدار** (ز.): قۆڵچی.

**ڕەخس**: ئافەرید. سەما، چۆپی، (ئەردە.) هەڵەکە.

**ڕەخسان**: ئافەرید بوون، داهێنران، گەیشتنی چتێک لە لایەکەوە، کە چاوەڕوانی نەکرابێ.

**ڕەخساندن**: ئافەریدکردن، داهێنان، پەیدا کردنی چتێک لە لایەنێکەوە، کە هیچ چاوەڕێی نەکرابێ، گەیاندن، ناردن.

**ڕەخساو**: چتێکە، کە لە لای لابەلاوە گەیشتبێ.

**ڕخسێن**: ڕەخسێنەر.

**ڕەخسین**: ڕەخسان.

**ڕەخسیو**: ڕەخساو.

**ڕەخش**: ناوی ئەسپی ڕۆستەمی کورد بووە. (ژا.) ئەسپی بەرز و باش، ڕەخت، خشڵ (بۆ ئەسپە).

**ڕەخشان**: درەخشان.

**ڕەخنە**: بەژاقیت، لەقەم، بەلل، ڕەغنەلێگرتن. (ئەردە.) کون، کونا، کەلبەر، کەلەوەر. ــــ دار: ڕەغنەدار. ــــ داری: ڕەغنەگری. ــــ گر: ڕەغنەگر. ــــ گرتن: بەلل ڕابوون، ڕەغنە گرتن، بەژاقیت. ــــ گری: ڕەغنەگری.

**ڕەخنما**: قیبلەنما، قوتبنما.

**ڕەخۆدیتی** (موک.): لە خۆڕا دیتن.

**ڕەد** (ئەردە.): شووێن، جێگە پا، شوێنی پێ. (باک.) ناوی زێیەکییە لە باشووری قامێشلوویە لە چەند ئاوان پێکدێ: تێکەڵی چۆمی چەقچەقی دەبێ و پێکەوە دەچنە ناو ڕووباری خاپوور.

**ڕەدە**: پیتاک. (کە.) پارە کۆ کردنەوە بۆ کڕینی چتمەک تا بە قازانج بفرۆشرێتەوە.

**ڕەددە**: پیتاکێکە لە لایەن چەند کەسێکییەوە کۆ دەکرێتەوە بۆ چتێک.

**ڕەدەوکردن**: گەڕاندنەوە، ناردنەوە، وەرنەگرتن.

**ڕەدبوون**: ڕەتبوون، تێپەڕین، پەڕینەوە.

**ڕەدکردن**: ڕەتکردن: تێپەڕاندن.

**ڕەدوو**: بەدوورا، بە شووێن.

**ڕەدووخستن**: هەڵگرتنی ئافرەتە بۆ یەکێکی بێگانە.

**ڕەدووکەوتن**: ڕادووکەوتن، وەدووکەوتن، وەدووکەوتنی ئافرەتە، کە بە بێ ڕای کەس و کاری بە شووێن پیاوێکی بێگانەدا، کە شووی پێ بکات. بۆ وەدووکەوتنی هەموو گیان لەبەرێکی دەبێ بە شوێن یەکێکی تردا: منداڵەکە ڕەدووی دایکی کەوت.

**ڕەدووکەوتوو**: هەڵگیراو، وەدووکەوتوو.

**ڕەدیماندن** (زا.): پڕکردن و سەر ڕێژکردن و لێوڕێژکردنی چتێک.

**ڕەز**: باخی ترێیانە، باخی مێوان. ــــ ی دێم: نز بە.

**ڕەزا**: چارە، سەروڕوو، سەروسەکوت، زەرە، شێوە، تەحر.

**ڕەزاقاڵ**: ڕەزاگران، خووێنتاڵ، ئێسک قورس، دزێو، ناشیرین. ــــ ی: ئێسک قورسی، ڕەزاگرانی، خووێنتاڵی، دزێوی.

**ڕەزاز** (ئەردە.): ڕەنگرێژ، ڕەنگکەر.

**ڕەزاسووک**: خووێن شیرین، ئێسک سووک. ــــ ی: خووێن شیرینی، ئێسک سووکی.

**رەزاشیرین:** ئێسک سووک، فرزک، خۆش خوێن، لەبەر دڵان، رەزاسووک. ـــ ی: ئێسک سووکی، فرزکی.

**رەزاقورس:** رەزاتاڵ، رەزاگران، ئێسک قورس، دزێو. ـــ ی: رەزاگرانی، ناشیرینی.

**رەزاقی:** جووره ترێییەکە.

**رەزاگران:** خوێنتاڵ، ئێسک قورس، رەزاتاڵ، دزێو، ناحەز، ناشیرین. ـــ ی: ئێسک قورسی، رەزاتاڵی، ناشیرینی، دزێوی.

**رەزانە:** باجێکە ساڵە و ساڵ لەبەری رەزان وەردەگیرێ.

**رەزانوو** (فە.): ئەژنۆ.

**رەزایی** (هەورا.): خولە، گەفە خولە.

**رەزەڤان** (باک.): رەزەوان. ـــ ی: رەزەوانی.

**رەزەڵە:** رێزەڵە، گیایەکی بەهارییە بەرێکی ووردی سوور دەگرێ بە قەد نۆکێکییە تامی وەکوو تەماتەی وایە.

**رەزەڵخوا:** کەسێکی داماوە، کە شایانی ئەوەبێ خێری پێ بکرێ، (ئەردە.) بۆ خودا بۆ خاتری خوا. ـــ یی: داماوی، بێنەوایی.

**رەزەن** (فە.): فیشەکدان، قەتاری فیشەکان.

**رەزەوان:** کەسێکە سەر پەرشتی رەزی بکات. ـــ ی: پیشەو کاروکرداری رەزەوان.

**رەزبەر:** یەکەمین مانگی پاییزییە، هەوەڵپاییز، (باک.) ئیلۆن، مانگی ئەیلولییە.

**رەزرەزۆک** (رەوا.): رێزەڵە، (بابا.) تووڵەرەزە.

**رەزڤان** (باک.): رەزەوان. (باک.) ـــ ی: رەزەوانی.

**رەزک** (باک.): گیایەکە، رێزەکە.

**رەزگنان:** لێ بردن، تێرا کردن، تێرۆکردن.

**رەزڵە:** رێزەڵە، تووڵە زەرە. مووڕەغەی پشت، (ئەردە.) مازی. (ئەردە.) ـــ پێچ: جووره رێزەڵەیەکە.

**رەزم** (هەورا.): شادی، بەزم، کەیف، ئاهەنگ. شەڕ، کێشە، جەنگ.

**رەزن** (جا.): فیشەکدان، رەخت.

**رەزنە** (هەورا.): رازیانە (گیا).

**رەزیانە:** (باک.) رەزیانگ، رازیانە.

**رەزیانگ** (باد.): رازیانە.

**رەزی دێم:** نزبە.

**رەزیل** (ع.): چرووک.

**رەژاندن** (باک.): رژاندن.

**رەژەن** (بابا.): دووده، دووکەڵی بنی مەنجەڵێیە.

**رەژتن:** رشتنی چاو.

**رەژتنەوە:** رشتنەوە.

**رەژمیری:** رەشمیری.

**رەژوو** (هەو.): رەژی، خەڵووز، رێژوو، زوخاڵ. گڤزۆنەک.

**رەژی:** بروانە: رەژوو.

**رەژیاگ:** چاو رشتوو، کل لە چاوکران.

**رەژیان** (باک.): رژان، برەژە: برێژە.

**رەژیدە** (کەل.): سازندە، دروستکار، چێکەر، چاکەر، ئەو کەسەیە چتی دروست بکات.

**رەس:** وولاخی بە ناوونیشان، رەتەوە، تەرووم. پێڕاگەیشتو، گەیشتو، دادرەس.

**رەسا:** تەواو، بڵند، درێژ.

**رەسانی:** پێڕاگەیشتن، پیاگەیشتن، تێڕاهاتن، بەش کردن.

**رەسانن** (کە.): گەیاندن.

**رەسایی:** پانی و پۆڕی.

**رەسە** (بار.): بنە گیایەکە نیو بەژن بڵندتر دەبێ لکی زۆر و شینە لەکاتی دروونیدا رەنگی زەرد دەبێ، کە هیشک بۆوە زەرد هەڵدەگەڕێ.

**رەسەن:** بنچینە، رەچەڵەک، نەژاد، مەحنەک، ریشە، رەتەوە، تەرووم. خانەدان، بەناوونیشان، پەسند، هەڵکەوتوو. نا ـــ: ناخانەدان. (فە.) گوریس، کە لە خوری بێ یا تەناف.

**رەسیاو** (فە.): گەیشتوو.

**رەسێن:** گەیێن.

**رەسیدە** (کە.): کوڕ و کچێکە خۆیان ناسیبێ.

**رەسیدەگەری:** بەسەر را گەیشتن.

**رەسێن** (کە.): گەیێن، راگەیێن، پێڕاگەیێن.

**رەسێن** (فە.، گەر.): گەیێن، گەییشتن. (ئەردە.) رزگاری، قوتار بوون.

**رەش:** (هەورا.) سیاو. سیاون، مشکی، قەنووسی، (زا.) سیا. شەوەزەنگ وەکوو بەختی کوردان تاریک و رەشە. رەنگێکە واژی سپییەو تاریک دەنوێنێ. ـــ کاڵ: کەژاڵ، کەژەڵ. قوون. ـــ قوون: سەری بە رەشی بابیدا دادەرێنن، بە ـــ داکەوتن: مردوو لێ مردن، برەشێ کەتن، (باک.) داوەڵ. جووره هەنجیرێکە.

**رەشانی:** دێهاتی بێ جووت، کرمانجی بێ جووت. رەشانگ. چێوەهەڵگیر، رەشایی لەشکر.

**رەشاتی** (باک.): رەشایی.

**رەشان:** (رەوا.) رەشە، بەچینی بزنان دەڵێن بەنێر ومێوە. گۆشتی بزن و نێرییە.

**رەشانگ:** سامۆتک، تارمایی، جەندەخەون، رەشەداڵ. خاڵخاڵ، قانقان.

**رەشاو:** ئاوی رەشی چاو، هەر چاوێکی ئاوی رەشی دابێ زوو چارەسەری نەکرێ کوویر دەبێ. خەڵووزاوێکە دارتاشان داری پێ خەت دەکێشن بۆ داهێنان و برینەوەی.

**رەشایی** (جا.، جەبا.، زەن.): خەڵکێکی زۆر و زەوەند، قەرەباڵغ، (دزە.) رەشەدار، (باک.) رەشاتی. تارماییەکە لە دوورەوە دیار بێ، تاپۆ، تاسۆ. لادێییەکە، کە جووت و بەرەی نەبێ. (موک.) رەشانگ، پارچە زەوی و خاکێکە لە ناو بەفرێدا دیار بێ.

**رەشایی داهاتن:** مەبەس لە تاریک بوونی چاوە.

**رەشە** (رەوا.): رەشان. جووره ماسییەکە. نێوی پیاوانە لە رەشید کورتکراوەتەوە.

**ڕەشەئولاغ** (ئەردە.): ڕەشەوولاخ.

**ڕەشەبا:** زریان، بای سەخت، هـوڕەە، زیـپ، (بـاک.) بارۆڤـە، بـازۆر، (زەن.) سیاوڤا، (باک.) بایێ ڕەش، باهۆر، باهۆس، باهۆل، بۆ تووتن خراپە بەلان بۆ مەرەزە باشە هەر مەرەزەییێک بیگرێتەوە دوورە لە گڕە و شەرا.

**ڕەشەبی:** جۆرێکە لە چوار جۆرەکانی دارە بی.

**ڕەشەتوو:** گاتوو.

**ڕەشەتی** (باک.): جۆرە ترێیەکە.

**ڕەشە جوو:** جوولەکەیەکە باوەڕی زۆر بە ئایینی مووسایی بێ.

**ڕەشە خێزان:** خێزانی زۆر.

**ڕەشەدان:** مەبەس لە قەلەڕەشکەیە. ڕەشانک.

**ڕەشەڕاو:** ڕاوی بێ ڕێ و جێ، بە تارێکی لە شوێن ڕاوگەران، ڕاوکردن لە شوێنێکیدا، کە بەفری کەمبێ و زۆرترینی ڕەشانک بێ. ڕاوێکە کارساتی شوومی تێدا ڕووبدات و یان ڕاوکردنەکە ئەنجامێکی وای نەبێ، کە نێچیری تێدا بگیرێ.

**ڕەشەڕشاوە:** (باد.) ڕشانەوە.

**ڕەشە ڕێحانە:** جۆرە ڕێحانەییێکی گەلاپانی ڕەشە.

**ڕەشە ساڵ:** ووشکە ساڵ، سیاساڵ، ساڵێکە کشتوکاڵ و ئاژاڵ زیان و ڕووشەیان تووشبێ.

**ڕەشەسیل:** ئازاری دەردەباریکەیە، کە گەیشتبێتە ڕادەیەکی وا چابوونەوەی نەبێ.

**ڕەشەش** (باک.): جێگایەکی نزمە ئاوی بارانەی تێدا کۆ بێتەوە، گۆلاو.

**ڕەشەک:** باسێکە، کە بۆ یەکەمین جار نووسرابێ تا بە پوختی لە بەری بنووسرێتەوە.

**ڕەشەگاوور:** فەلەیەکە زۆر باوەڕی بە ئایینی خۆی بێ. ـــ ی: زۆر بڕوایی فەلانە بە ئایینی خۆیان.

**ڕەشەگور** (باک.): بۆر، تاریک.

**ڕەشەگوون:** گووێنی ڕەش.

**ڕەشە گرانەتا:** کەوتوویی، کەفتەیی، ڕەشە گرانە تێ. تایەکی زۆر سەختە لە ئەندامی مرۆی سەر هەڵدەدا و زۆر کەسی پێ لە ناو چووە.

**ڕەشە گرانەتێ:** بڕوانە: ڕەشەگرانەتا.

**ڕەشەگووێنی:** گووێنی ڕەش.

**ڕەشەلۆ** (هەو.): گیایەکی بۆگەنە، بڕوانە: لۆ.

**ڕەشەماڵ** (ڕەوا.): مانگا، گا، گامێش، کەڵ، ڕەشەوولاخ.

**ڕەشەمە:** مانگی هەرە دوایی زستانییە، (باک.) سبات، ڕەشەمێ، (هەورا.) سیاو مانگ، مانگی شباتە، کە ٢٨ ڕۆژە و پشیلەی تێدا بەبا دەبێ.

**ڕەشەمێ:** ڕەشەمە.

**ڕەشە نەخووێندەوار:** مرۆی کەمسەواد.

**ڕەشەو بوون** (ئەردە.): ڕەشبوون لە پێش هەتاو و ئیتر.

**ڕەشەوبی:** دەک ڕەشبی (لە تووک کردندا).

**ڕەشەوولاخ:** (هەورا.) سەواد، دەواری ڕەش، دووسم، (ڕەوا.) ڕەشەماڵ، گا، مانگا، کەڵ، گامێش.

**ڕەشباز** (کە.): ڕەشبەڵەک، ڕەش وسپی تێکەڵاو، ڕەشبازوو، چتی ڕەش و سپی. (کە.) ڕەش و چەرمگ.

**ڕەشبازگ:** ڕەشبازوو.

**ڕەشبازوو:** ڕەشباز.

**ڕەشبام:** ڕەشباو، ڕەنگڕەش، ڕەشکار.

**ڕەشباو:** چتێکی بۆرەڵوکەیە بە سەر ڕەشیدا بڕوانێ.

**ڕەشبەڵەک:** مەرێکە ڕەشی لە لەشیدا لە سپییەکەی پتر بێ. داوەتی ژن و پیاوان و کوڕ و کچانە بە تێکەڵاوی، (باک.، شکا.) جەرگە بەز، گۆوەند. دوو هەودا یا بەنی ڕەش و سپیە، کە پێکەوە بادرا بن، ڕەش و سپی، ڕەشباز، (کە.) ڕەش و چەرمگ. (باک.) نووسراوە، نامە، ئەحمەدی خانی لەنەو بەهاریدا گوتوویە: ڤان چەند ڕەشبەلەکا.

**ڕەشبگیر:** نێلجاری، جێلجاڕی، گرتن و کۆ کردنەوەی مەردومە لە لایەن میری، یا گەورەییێکەوە بۆ فەرمانێکی گرنگ.

**ڕەشبۆرە:** ڕەنگی ڕەش و سپی تێکەڵاوە بۆ وولاخی بەرزە بەکاردەبرێ، ڕەشکەوە، بۆر بەسەر ڕەشیدا بڕوانێ.

**ڕەشبۆز:** وولاخێکە ڕەنگی ڕەش و بۆز بێ.

**ڕەشبوون:** مەبەس لە ڕەزاگران بوونی یەکێکییە لە پێش چاوی کەسێکی یا گەلێکی، لەبەر چاو کەوتن.

**ڕەشبوونەوە:** سیابوونەوە: سیاوبوونەوە، بوونەوە خەڵووزی پڕ ڵووە ئاوورە. دامرکانەوەی سوورێژە و خروێرکەیە. چوونەوەی بەفرە. کووژانەوەی چرای دەروون و ناهومێدی.

**ڕەشبین:** بەدبین.

**ڕەشپۆش:** بۆ کەسێک بەکاردەبرێ، کە خۆشەویستێکی لێ مردبێ و بەرگی تازیەی پۆشیبێ، قەلاخی پۆش. ـــ ی: پۆشینی بەرگی تازیە و شین و پرسە.

**ڕەشپۆشین:** ڕەشپۆشی، بەرگی پرسە لەبەرکردن.

**ڕەشتاڵ:** ڕەنگ بۆر لە بۆ وولاخان بەکاردەبرێ.

**ڕەشتاڵە:** مەردومی ڕەشباو، گیان لەبەرێکی وایە بەڕەشی بنوێنی.

**ڕەشتەپلاو:** هەرشتەپلاو.

**ڕەشتن** (کە.): چاوڕشتن، ڕشتنی چاو بە کل و کلچێوک، ڕژتن. باش جێ بە جێ کردن.

**ڕەشتنەوە** (ئەردە.): داگرتن.

**ڕەشتی:** شەدە، مشکی، یا سەرپێچ یا کۆڵوانەی ئافرەتانە لە ئاوریشمی.

**ڕەشخووێن** (موک.): کەسێکە سەوادی کەمبێ و هەر لە گۆترە چتی بخووێنێتەوە. ـــ ی: شێوەی کەمسەوادی.

**ڕەشداگەڕان:** ڕەشهەڵگەڕان، ئاڵۆز بوون.

**ڕەشداگەڕیان:** بە ڕەشداگەڕان.

**ڕەشداگیرسان:** ڕەشبوونی ئەندام لە ڕقان یا لەبەر هەتاوێ.

**ڕەشداگیریان:** ڕەشداگەڕان.

**ڕەشڕاهاتن:** گومبوون و نەمانی چتێک بە کوتوپڕی.

**ڕەشڕەشک** (باک.، فە.): ڕەشکە، زیزانە.

**ڕەشریڤیک** (باد.): ڕەزریڤیک، گیایەکە بەرەکەی بەقەد نۆکێکییەو لەنێو تەماتان شیندەبێ.

**ڕەشقوون**: سەری بەڕەشی بابی دادەڕێنن، واتە سەری لە قوونی بابی دەنێن.

**ڕەشک** (باک.): ڕەشکێنەی چاوە. وێنەی نیوەی ڕوو. کەلاشی پەڕۆ و لباد و مووی ڕەشە بۆ ووشکانی. قوولی ڕەش، سەندەل، دارێکی بۆنخۆشە. (باد.) کاڵەی موویین، کاڵەیەکە هەمووی لە بەنی یا لە خوری یا لە لباد دروستکرابێ، کاڵەی پەڕۆ.

**ڕەشکاچاڤ** (باد.): ڕەشکێنەی چاو.

**ڕەشکاو**: ڕەشباو، ڕەشتاڵە.

**ڕەشکە**: خەرارێکی کونکونی گرێچنە لە موو دروست دەکرێ کاوو کلۆسی پێدەگوێزرێتەوە. ڕەشڕەشک، بەری گیایەکیە وەکوو گەنمی وورد وایە، بەلام ڕەشە و بە سەر کوللێرە و نانی وەردەکەن و بە سەر نانیشەوە بۆ خۆشی. شەڵتە، داوەکا، تەنراوێکی شاشە لە موو بۆ کا کێشانی بەکاردەبرێ. ـــ ی کایە: تاینچە. (ڕەوا.) ڕەشکێنەی چاو. (شەق.) تیکوڵە شینەکەی گوێزییە، ڕزێ. (بابا.) جوورە ترێیەکە پێست ئەستوورە.

**ڕەشکە گیز** (خۆ.): پەلکە شینەکانی گوێزی تەڕە، بەگوێزێکیش دەڵێن، کە تیکوڵە شینەکانی پێوە ڕەش و ووشک هەڵگەڕابێ.

**ڕەشکەڵە**: ڕەشتاڵە.

**ڕەشکەڵەک** (خۆ.): (کۆ.) ڕەشی کەلەکی، (فە.) ڕەشڕەشک، گیایەکە لەنێو کەڵەکە بەردان شین دەبێ بەنی پێ ڕەشدەکرێ.

**ڕەشکەن** (ئەردە.): ڕەشانک، ڕەشایی و ووشکانی ناو بەفرە.

**ڕەشکەوە**: ڕەشێکە بە سەر بۆریدا بنووێنی، ڕەشبۆرە.

**ڕەشکەوەگ**: ڕەشکەوە.

**ڕەشکەوپێشکە**: چرسین، ئازارێکی چاوانە، چاوی ـــ ی دەکا: واتە چتی ڕوون نابینی چتێکی ڕەش وەکوو مێشوولەی بە پێش چاویدا هاتوو چۆیە دەکات.

**ڕەشکەو پێشکە کردن**: بڕوانە: ڕەشکە و پێشکە.

**ڕەشکەوسپیکە**: مەبەس لەچتی نووسراوە، بۆ وێنە ئازاد بە ـــ یدا ڕووانیوە واتە خوورێندۆتەوە.

**ڕەشکردن**: لەبەر چاو خستن، سووک کردن. سیاکردن.

**ڕەشکردنەوە**: کوژاندنەوە، بۆ ئاوور و نووسەوەری و هەموو چتێکی بەکاردەبرێ. داپۆشینی زەل و قامیشی سەر بانی تازە بە گڵ، دیاربوونی چتێک لە دوورەوە. نووسینەوەی مەشق بە پڕی.

**ڕەشکوژ**: برێتییە لە یەکێک، کە ئازاری مرۆی بدات بە بێ لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە: فیسارەکەس ـــ ە: واتە دەست ناپارێزێ. ـــ ی: دەست نەپارازتن، ڕاست و چەپ یا لەچاک وخراپ دان و ئازار پێگەیاندن.

**ڕەشکۆیی**: ناوی جوورە ترێیەکییە.

**ڕەشکووێت**: جوورێکە لەڕەنگی چارەوێ، کە کووێت بێ و بەسەر ڕەشیدا بڕوانی، (هەورا.) مەیلەو سیاوە.

**ڕەشکی کەڵەکێ**: ڕەشکەڵەک، گیایەکە.

**ڕەشکێنە**: (باد.) ڕەشکاچاڤ، ڕەشک، ڕەشی چەم، (هەورا.) سیاوی چەم، بە شە ڕەشەکەی چاوە، کە لەنێو سپێنەیدایە و گەورەیە و بەبەڵە (بیبیلە) کەشی لە نێوەڕاستیدایە.

**ڕەشگەری**: خێڵێکی کوردە لە نزیکی موسڵێ نێزیکی دووهەزار ماڵ دەبێ.

**ڕەشگوڵ**: جوورە گەنمێکە لە حۆڵەی ووردترە گوڵی ڕەش و دەنکی سپییە بۆ دانەوێڵە دەستدەدات.

**ڕەشما** (باک.): ڕێشمە.

**ڕەشمار**: جوورە مارێکی ڕەشە. ڕەشماڵ.

**ڕەشماڵ**: خێوەتی ڕەش، دەوار، کووێن، سیاماڵ، تاووڵ، (هەر.) کوین.

**ڕەشماڵ نشین**: خێلات، خێڵەسات.

**ڕەشمە** (باک.): خشڵی ئافرەتانە، کە وەکوو گوڵی جووان و بۆنخۆش و مێخەک چتی وایە. ڕێشمە، جلەو، دەسکەوساری، چتێکیشە بەسەر وولاخی بەرزە دادەکرێ گوریسێکی پێوەیە بۆ ئەمەی ببەسترێتەوە، ڕەشمو، هەوسار.

**ڕەشمێو** (باک.): جوورە ترێیەکە زوو پێ بگا.

**ڕەشمیری**: جوورە ترێیەکی ڕەشە گلووی وەکوو هی فەرخی وایە دەنکی هەیە بۆ مێلا قیش دەست دەدات و دەشکرێتە مێووژ، دەنکی گەورە و ڕەشی درێژە و هێشووشی شاشە.

**ڕەشۆ**: ڕەشمە، هەوسار، ڕەشوە. (باد.) ناوی نێرینانە.

**ڕەشوبازگ**: بەڵەک، ڕەش و سپی.

**ڕەشۆکا**: بەرەبابێکە لە ئێلی ڕەمان.

**ڕەشۆکە** (باک.): ڕەشۆڵە، ڕیشۆڵە.

**ڕەشوکی**: چتێکە تایبەتی نەبێ. شینکە، سەرپڕ، جوورە تفەنگێکی کۆنە. چتی گەندوو خراپە سا باڕووت بێ یا توتن.

**ڕەشۆڵە**: سێروو، (باد.) ڕەشووێڵە، (هەورا.) ڕیشۆڵە، (باک.) ڕەشێلە، گاوانی. (باک.) جوورە باڵندەیەکە.

**ڕەشۆیلە** (هەورا.): ڕەشۆڵە.

**ڕەشووە**: ڕەشمە، هەوسار.

**ڕەش و بازگ**: ڕەشبازک، ڕەش و سپی.

**ڕەش و ڕووت**: نەبوو، هەژار، زوگورت، مەردومی ڕووتی هەژاری کەساس ڕووت و قووت.

**ڕەش و ڕووتکردن**: ڕووتکردنەوە.

**ڕەشووێداری** (باد.): چیرۆکێکە.

**ڕەشهەڵگەڕان**: ڕەشداگیرسان.

**ڕەشهەڵگەڕاو**: ڕەشداگەڕاو.

**ڕەشێ** (باد.): ناوی ئافرەتانە.

**ڕەشیش** (باک.): ڕەشیش.

**ڕەشێڵە** (زازا.): ڕەشۆڵە، قازەلاخ.

**ڕەشێنە**: ڕەشکێنە، ڕەشی گلێنەی چاو.

**ڕەشی**: سیایی، ڕەشایی.

**ڕەشینە:** ڕەشکێنەی گلێنەی چاو، ڕەشایی چاو.

**ڕەشێتی:** ڕەشایی.

**ڕەعنا:** نەرم و نۆڵ، شل وملل، جووان. ـــ یی: نەرمی، شلی، نەرم و نۆڵی، جووانی.

**ڕەغنە:** ڕەخنە. ـــ گر: ڕەخنەگر، کەسێکە نەنگ لە چت بگرێ. ـــ گرتن: ڕەخنەگرتن.

**ڕەغنەگری:** نەنگ گری.

**ڕەغێز** (کە.): ڕەگ و ڕیشەی ڕووەکانە.

**ڕەشی چاو:** ڕەشکێنە.

**ڕەشی چەم** (هەورا.): ڕەشکێنە.

**ڕەشی شەوێ** (باد.): شەوە.

**ڕەف** (باک.): فڕەفڕ. جنێو بە مرۆی زۆر موسڵمان دان. تاقەی نێو دیوارییە بۆ چت لەسەر دانان.

**ڕەفاندن** (باک.): پینەکردن.

**ڕەفە** (هەورا.): ڕفحە، ڕفە.

**ڕەفەڕەف:** فڕەفڕی باڵی باڵندانە.

**ڕەفت** (ئەردە.): ڕەفتار.

**ڕەفتار:** شوو، کرشە، شووف، دەست لفۆک، پیشە، ڕەووش، ئەدا، شێوە، تووزم، تەرزە. کردایێکە خووی پێوە گیرابێ. ـــ کردن: ڕابەستن. ـــ بەد: بەدتووزم.

**ڕەفتارخۆش:** خۆشڕەفتار.

**ڕەفتە** (دزە.): ڕفحە.

**ڕەفتەنی:** کەسێکە لە سەر ڕۆیشتن بێ.

**ڕەفش** (باک.): مرازێکە لەناو کەرەستەی تەونیدا دارێکی پان و درێژە. (باک.) بەردێکی پانە منداڵان گەمەی پێ دەکەن و هەڵدەپەڕن و بەستە و گۆرانی دەڵێن.

**ڕەفک** (باد.): قەفەزەبەندی. (ز.) ڕفە، ڕفی.

**ڕەفکە** (هەو.): ڕفحە، ڕفە.

**ڕەفۆ** (باک.): مێگەلێکە، کە هیچ ناچێتە تەویلەوە.

**ڕەفی** (باد.): کەنار و قەراخی چت.

**ڕەفیزگە:** ڕەفیسکە.

**ڕەفیسک:** ڕەفیسکە.

**ڕەفیسکە:** دەماری چاڵایی بن ئەژنۆیانە لە پانیەوە تا لای سمتی مرۆڤ، بەچاڵایی بن ئەژنۆش دەڵێن ڕەفیزگە.

**ڕەڤ** (باک.): ڕەو، تەقە. ـــ لێدان: ڕەوکردن، هەڵاتن، تەقە تێکەوتن، خوەدان ڕەڤێ: هەڵاتن.

**ڕەڤاشک** (باک.): مرازێکە چتی پێ لە خەرت دەدەن و دەنەخشێنن و خاوێن دەکەن.

**ڕەڤاندن** (باک.): فڕاندن، ڕفاندن، ڕەواندن، شکاندنی دوژمن.

**ڕەڤدە** (باک.): مێگەلێکی چکۆلەیە زۆرتر بۆ سەگ و گورگ بەکاردەبرێ.

**ڕەڤۆ** (زا.): ڕەووک.

**ڕەڤۆکە** (باک.): ڕەڤۆنەک، هەڵاتوو، قاچاخ.

**ڕەڤۆنەگ:** هەڵاتوو، قاچاخ.

**ڕەڤی** (باک.): پۆشاک، جل و بەرگ. (باک.) ڕەمی، ڕەڤیائاگر، ڕەمیا ئاگر، گڕی ئاووری، گوڕی ئاگری.

**ڕەڤین** (باک.): ڕەوین، هەڵاتن، تەقە تێکەوتن، شکان، بڕەڤە: هەڵبێ.

**ڕەڤینی** (باک.): ڕوونی، ڕووناکی.

**ڕەڤێ** (باد.): ناوی ژنانە و لە ڕەڤ و بازدان وەرگیراوە.

**ڕەق:** سەخت، قایم، ڕقڕقۆک، (باک.) هەمیز، پالەپال، پتەو، توند، ڕەپ، ووشک. (باک.) ڕەقە.

**ڕەقاز** (خۆ.): گووێزێکە بە دارەکەیەوە ووشک بووبێتەوە. (خۆ، هە.) قوولاری.

**ڕەقاڵە:** پێچکەی لانکییە.

**ڕەقان:** ڕەقەن، چەقەن، خرپ، (ئەردە.) زربان، گیرێن، چەقێن، زەوی ڕەق و سەخت، گوولات، (ئەردە.) سەخناخ، شووێنی ڕەق.

**ڕەقاندن:** کوتان (بۆ بزمار و چتی تر). بێرازکردن. لێدان، کوتەک کاری، تەقاندن، لە دەرکەدان.

**ڕەقاندنەوە:** گەڵاڵە کردن و ڕێکخستنی ئاسن لە پاش سارد بوونەوەی.

**ڕەقانن:** ڕەقاندن.

**ڕەقاننەوە:** ڕەقاندنەوە، کوتانی ئاسنە بە چەکوچ لە پاش ئەوەی، کە لە کوورەدا سووربۆوە و بۆ چت دروستکردن.

ڕەقە

**ڕەقانی:** ڕەقەن.

**ڕەقایی:** ڕەقانی.

**ڕەقە:** ڕەقیاو، کیسەڵی ئاوی، (باک.) ڕەق، داعبایەکی ئاوییە و ڕەق و کلکدارە و وە کیسەڵی دەچێ. تەقە، دەنگی لێدانی چتییە. دەنگی چەرم و کەوڵی ووشک و ئیتر.

**ڕەقەڕەق:** دەنگی قاقەز و قابقاب و مەشکەی ووشک و ڕەقە، ڕپاڕپ، ڕقاڕک، ڕقڕقۆک.

**ڕەقەڵ:** ڕەقەڵە.

**ڕەقەڵاتن:** ڕەقهەڵاتن.

**ڕەقەڵاتوو:** ڕەقهەڵاتوو.

**ڕەقەڵە:** لەڕ، داڵگۆشت، مسری گۆشت، لاواز. کەشکەژنۆ و لوولاکی گیاندار.

**ڕەقەمار:** جوورە مارێکی ڕەقەڵەیە.

**ڕەقەن:** زەوی سەختی بەردەڵان، ڕەقان. ـــ ی: شووێنی ڕەقەن.

**ڕەقەنبی:** شووێنی ڕەقەن.

**ڕەقەوە بوون:** ڕەق بوونەوە، مردنی گیاندارە لەبەر تەووژمی ساردی. ڕەق و ووشک بوون.

**ڕەقەوبووگ:** گیانداری ڕەق بووەوە.

**ڕەقەو بوون:** ڕەق بوونەوە، ووشک بوون.

**ڕەقبردنەوە:** ڕەقبوونەوەی گیاندار.

**ڕەقبوون:** ڕەقیتە کردن لە سەرمان، توند بوون و ووشک و سەخت بوونی هەندێ چت وەکوو: چیمەنتۆ، قسڵ، گێچ، قوڕ، ڕەپ بوون.

**ڕەق بوونەوە:** لەسەرمان ڕەق هەڵاتن.

**ڕەقبیەی** (هەورا.): ڕەقبوونەوە، ڕەقیتە.

**ڕەقرەق** (باک.): گرمەی هەوری.

**ڕەقشاندن** (باک.): ئاپرژێنکردن، ئاورشاندن.

**ڕەقشین** (باک.): ئاپرژێن کران.

**ڕەقف** (باک.): بەردچن، سەنگچن، بەردرێژ، ساچمەرێژ. ـــ کرن: سەنگچن کردن.

**ڕەقفاندن** (باک.): ڕێک و پوختکردن، بەردرێژکردن و سەنگ چنکردن. ڕێک وپێک.

**ڕەقڵە:** ڕەقەڵە، لەڕ، لاواز، بێ تووک، باریک.

**ڕەق وتەق:** زەوی بێ ئاووگیا، چتی ڕەق و ووشک، شوێنی خاڵی، لە خانوویەکی ـــ دا دانیشتووم، خوت وخاڵی. خواردەمەنی بێ پێخۆر. لەڕ و لاواز و نیشک، بۆ گیان لەبەرانە.

**ڕەقاوڕاستی:** یەکلایی.

**ڕەق وڕەواڵ** (ئەردە.): ڕەق و تەق، سەخت.

**ڕەق ورووالە:** ڕەق و تەق.

**ڕەق و فیق** (ئەردە.): ڕیق و فیق، (ئەردە.) ڕەق و تەق، لەڕولاواز.

**ڕەق ووشک:** چتی لەڕولاواز، ووشک و سەخت، ڕەق و تەق.

**ڕەقهەلاتن:** ووشک و ڕەق بوونەوەی چت.

**ڕەقهەلاتوو:** چتی ووشک و ڕەق بووەوە.

**ڕەقهەڵگەڕان:** ڕەقهەڵگەڕان.

**ڕەقهەڵگەڕاندن:** ووشک کردن.

**ڕەق هەڵگەڕاو:** ووشک و ڕەق بووەوە.

**ڕەق هەڵهاتن:** ڕەق هەلاتن، ڕەقبوونەوە، ووشک بوون.

**ڕەقهەڵهاتوو:** ڕەقهەڵگەڕاو.

**ڕەقێتی:** ڕەقی.

**ڕەقێلە** (ئەردە.): کەمێل، کەمێلە، ڕەقێنە. ڕەقێن، ڕەقان، کرێن، چەقێن، گوولات، زەوی ڕەق.

**ڕەقێنە** (کە.): جوورە ئێسکێکە ڕەق نەبێ. لوولاک، ڕەقەڵەی قاچ، کەمێل، کوڕکوڕۆژە، گنجی.

**ڕەقی:** ڕەقێتی، سەختی. (فە.) قرقر، کرکرۆک، کرکرۆچکە. جۆرە سابوونێکە.

**ڕەقیاگ:** لێدراو.

**ڕقیو:** ڕەقەی ناوێ.

**ڕەقیتە** (ڕەوا.، هەو.): نەخۆشێکە دەمارەکانی تێکڕا ڕەق دەبن و هیچ ئەندامێکی نا جوولێ لەبەر ساردی تووش دێ، قۆلنج، برک.

**ڕەقینە** (ئەردە.): ئێسکی لۆلاک. ڕەقێڵە، کەمێلە، قرتماغە.

**ڕەک** (باک.): بنار، هەتەر. ـــ کرن: پێداگرتن، پێ لێ داگرتن، هەتەر کردن، بنار کردن، لەسەر ڕۆیشتن، میچ لە سەر گرتن، جەخت کردن.

**ڕەکەم** (باک.): قەفەز.

**ڕەکک** (باک.): بێرکم، قەفەز.

**ڕەکێشە:** ڕەوکێشە، گیاکێش، ڕاکێشە، گیایەکی گەڵاپانە وەکوو ترشۆکە گایانەیە ئەگەر بەتەنهایی یا لەناو هەویری جۆی پیشاو لەسەر هەر کولک، قونێر یا گرێ و دوملەیکی دانرێ یا زوودەری دەکات یان دەیرەوێنێتەوە، ئەگەر بەتەڕی یا بە ووشکی بکرێتە چاو بخورێتەوە بۆ کۆخە باشە.

**ڕەگ:** (باک.) ڕەک، ڕە، ڕا، ڕەه، (دەر.) ڕەو، دەمار، چەند لوولەیەکە لە جەستەی گیاندار خوێنی پێدا هاتوو چۆ دەکات، دەمارە باریکەکانە. ریشە و دەماری دار و گژ و گیایان. ڕەتەوە، بنە چەکە، ڕەچەڵەک، تروم.

**ڕەگاوڕەگ** (ئەردە.) ڕەگوارگە، دەمار وەرگەڕان.

**ڕگاوڕەگ کەفتن** (ئەردە.): دەمار وەرگەڕان.

**ڕەگەز:** ڕەچەڵەک، ڕەگ، دەمار، بنەماڵەیێکە، کە عێلی لێ کەوتبێتەوە. ـــ چاک: ڕەسەن.

**ڕەگەزناس:** ڕەچەڵەکناس. ـــ ی: ڕەچەڵەکناسی.

**ڕەگەڵرەگەڵ:** کەسێکە خۆی لەگەڵ خەڵکی بخات.

**ڕەگەڵکەوتن:** لەگەڵکەوتن.

**ڕەگەڵکەوتوو:** لەگەڵ کەوتوو.

**ڕەگبرە:** مڵە، قوزبرکە، جۆبڕکە، داربرکە.

**ڕەگداکوتان:** لە جێگایەک جێگیر بوون و مانەوە. چوونە خوارەوەی ڕەگ و ریشەی ڕووەکانە بە زەویدا.

ڕەگبرە

**ڕەگدڵ:** ڕەگی دڵ.

**ڕەگزینگ** (ئەردە.): ڕەگزینگی، ڕەگی گیان.

**ڕەگزینگی** (ئەردە.): ڕەگی گیان لەبەر.

**ڕەگ گەردن:** ڕەگی مل.

**ڕەگ مل:** ڕەگی مل.

**ڕەگاوڕەگ:** ڕەگاوورگە.

**ڕەگ و ریشە:** بێخ، بێخ و بنج. ـــ ی داران: ڕەگی داران، ڕەغز، کرۆک، بێخ، کۆک.

**ڕەڵم** (موک.): ڕەتم، خیزی زۆر وورد.

**ڕەم** (زەن.، ڕۆژ.): ڕەو، سڵ، ترس، چڵەگ. ـــ کردن: هەڵاتن، ڕاکردن، سڵەمینەوە. مێگەل، ڕوێڵ، ڕەمە.

**ڕەما** : ڕەمان، ناوی ئێلێکی کوردە بە ئازایی ناودارن ، هەموو ئاغایەکانی ـــ بە دەستی دوژمنی کوردان کوژراون بە سەرهاتی ڕەما لە مێژوو و چیرۆکی کوردانددا فراوانە و پایەدارە.

**ڕەمان** : ڕەما.

**ڕەمانە** : (شن.) چالایی ژێر ئەژنۆیانە.

**ڕەماندن** : (ئەردە.) ڕووخاندن، کاوولکردن، بەیەکادان. تاراندن، ڕاونان، ترساندن.

**ڕەمانن** : ڕماندن. تاراندن، ڕاونان، ترساندن.

**ڕەمای** (هەورا.): ڕووخاندن، وێران بوون. ڕاکردن، ڕەوینەوە.

**ڕەمە:** مێگەل، ڕووێڵ، ڕەووگ، گەلە.

**ڕەمەدانە:** جوورێکە لەگاڵ، گاڵەدێمیلە.

**ڕەمەکی:** وولاخی سەرچڵ، بارگینێکە بەکارسوواری نەیەت. چتی ڕەشۆکی، کێوی.

**ڕەمەکێتی:** خۆڕسکی.

**ڕەمەن:** گیاندارێکە لە ترسان هەڵاتبێ.

**ڕەمتەلە** (باک.): ڕەوتەلە، گەوج، گێل.

**ڕەمک:** تیرەیەکە لە ئێلی بڵباسان .

**ڕەمکار:** گیاندارێکە سڵ بکات، سڵکەر، ترسەنۆک.

**ڕەمکەر:** ڕەمکار.

**ڕەمکردن:** سڵ کردن، سڵەمینەوە.

**ڕەمڵ:** (ع.) فاڵ. ــ ئاوێژتن: فاڵگرتنەوە.

**ڕەمڵچی:** فاڵچی.

**ڕەمڵکردن:** فاڵچێتی کردن. ڕەشکەوپێشکەی چارکردن.

**ڕەمڵگرەوە:** فاڵچی.

**ڕەمڵ گرتنەوە:** فاڵگرتنەوە بۆ دۆزینەوەی چتێکی نادیار.

**ڕەمڵ لێدان:** لە چتێکی نادیار دووان.

**ڕەمنە** (کە.، ڕۆژ.): ڕاکردوو، هەڵاتوو.

**ڕەمۆ** (باک.): نێودار، بە ناوبانگ، ناسراو، دەنگین.

**ڕەمیاگ** (ئەردە.): ڕوویاگ، ڕەویوەوە، ترساو.

**ڕەمیان:** ڕەمکردن، سڵەمینەوە.

**ڕەمێن:** سڵەمینەوە، ڕەوینەوە.

**ڕەمی:** (باک.) شەبەق، ڕووناکی، ڕۆشنی، بڵێسە، گڕی ئاووری.

**ڕەمین** (ڕۆژ.): ڕاکردن، ڕەوینەوە.

**ڕەن:** ڕووت، بێباک، ڕەند، بێمار. زنجیرە کوڵۆشێکە بەگردی لە جێی خەرمان دادەنرێ ئەوجار نیوەکەی پردەکرێتەوە و دەکرێتە خەرمان. (کۆ.) پارچە زەوییێکی کەمێک بڵند لە قەراخ چۆمێکی هەڵکەوتبێ و جارجارەش ئاوبیگرێتەوە، بە هەموو جوورە بڵندایێکیش دەڵێن، کە لە کەنارخۆی دروستی بکات.

**ڕەنە:** ڕنە، ڕەندە. ڕندە، کوتانی گوڵی مەرەزە. ڕەندەی دارتاشی یا پەنیر و توور و گێزەر و چتی تر ئەنجنین.

**ڕەنەدان:** ڕەندەکاری.

**ڕەنج:** گارنگ، جەفا، ڕێنج، ئازار، سزا، چەرمەسەری، جەور، کوێرەوەری، ئاهێن، ئاهین، ئەرک، دەردەسەری.

**ڕەنجان:** تۆران، قین بوونەوە، دڵشکان، تووڕەبوون. ــ دن: تۆراندن، تووڕەکردن، ئازارکردن، دڵشکاندن.

**ڕەنجانراو:** تووڕەکراو، ئازاردراو.

**ڕەنجانن:** ڕەنجاندن.

**ڕەنجاو:** ڕق هەستاو، تۆراو، وەئازارهاتوو، دڵشکاو.

**ڕەنجەڕۆ:** ڕەنج بەفیڕۆ، ڕەنج بەخەسار، فەلەک زەدە، چفتە، کەسێکە لە فەرمانێکیدا زۆرئازار بکێشێ و سوودیشی لێ نەبینێ.

**ڕەنجەڕۆیی:** ڕەنج بەفیڕۆیی، ڕەنج بەخەساری، ماندووبوون لەفرمانێکیدا، کە بێکەڵک بێ.

**ڕەنجبەر:** کارگەر، ڕێنجبەر، کاردار، جووتیار، جووتێر، پاڵە، کرێکارێکە، کە بەمانگ یابە ساڵ گیرا بێ. ــ ی: جووتیاری، جووتێری، پاڵەیی، کرێکاری، ڕێنجبەری کردنی کارێک بۆ کەسێکی بەمانگانە یا بەسالانە.

**ڕەنج پێدان:** ئازاردان.

**ڕەنج پێکێشان:** ڕەنج پێدان.

**ڕەنج پێگەیاندن:** ئەنراندن، ئەرناندن، ئازاردان.

**ڕەنج پێگەیێن:** ئازاردەر.

**ڕەنجدان:** ئازاردان، ئازارکێشان، ڕەنج کێشان، خۆماندووکردن و تەقەلادان لەفەرمانێکیدا.

**ڕەنجدەر:** ڕەنجبەر.

**ڕەنجش:** ئازار.

**ڕەنج کێشان:** (باک.) ئەرنان، ئەنران، ئەنرین.

**ڕەنجیاگ:** ڕەنجاو، دڵ ئێشاو، لالووت، ئاڵۆز.

**ڕەنجیان:** ڕەنجان، دڵتەنگ بوون.

**ڕەنجیدە:** ڕەنجاو.

**ڕەنجین:** ڕەنجان.

**ڕەند:** پارچە زەوییێکە، کە لە ناو چۆمیدا بەهۆی لافاوەوە پەیدابوو بێ. ئازا، بێ باک. توندوتۆڵ، چالاک. جوان، ڕەزاشیرین، لاو، خۆشڕەفتار. زمانشیرین، دڵفراوان، بەخشندە، ناندەر، چاک، باش، ڕووخۆش.

**ڕەندانە:** ئازایانە، بێ باکانە. خۆشڕەفتارانە.

**ڕەندە:** کوولەک. ــ ی دارتاشان: (باک.) ڕەندەشە، ڕەوێژەک، ڕندە، ڕندک. دەمە ئاسنێکی پانە وەکوو هی تەشولێی لە دارێکی بڕاوە دارتاشان داری پێ لووس دەکەن. ــ لێدان: ڕەوارتن. (باک.) ڕندەک، ڕەندەی پەنیر و توور و گێزەرو و چتی وا. تەنەکەیەکی کونکونی زبرە پەنیر و چەوەندەر و توور و چتی وای پێ وورد دەکرێ.

**ڕەندی:** ئازایی، بێباکی. توندوتۆڵی، چالاکی. جووانی ڕەزا شیرین، لاوی خۆشڕەفتاری. زمانشیرینی، دڵفراوانی، ناندەیی، چاکی، باشی.

**ڕەنگ:** جوور، چەشن. بەو ــ ە: بەو چەشنە. فێڵ، ساختە، کەڵەک، حوقە. تەن، گۆن، (باک.) ماد، تووک، ڕەشید، وەندەی، مەبەس لە سپی، سوورو زەرد و ڕەش و شین و کەسک و پەنبەیی و بۆر و ئیترە. ــ کردن: مالستن. بێ ــ : بێ تووک، بە ــ : ڕەنگدار، ڕەنگین. وەشانەوە، ئاغاتی دکەڤە ــ ێ وی: ئاغایەتی لێ دەوەشێتەوە. نەخش.

**ڕەنگار:** کەندەسمە.

**ڕەنگارە** (کۆ.، خۆ.): باڵندەیێکی زەرد و کەسکە بەقەد ڕیشۆڵەیەکیە بەلان باریکترە و مێش هەنگووینی دەخوا و هەموو جوورە مێشێکی تریش.

**ڕەنگاڕەنگ:** (باک.) ڕەنگاوڕەنگ. ــ کرن : گۆڕین.

**ڕەنگاڵ:** ڕنگال.

**ڕەنگاڵە:** (هەو.) کەندەسمە، ڕەنگارە. مەلێکی ڕەنگینە بەقەدەر سێروێکی دەبێ.

**ڕەنگامە:** (گەر.) ، ڕەنگاوڕەنگ، ڕەنگین.

**ڕەنگاندن:** جووانکردنی چتێک بە گەلێ جۆرە ڕەنگ.

**ڕەنگاو** (سل.): ڕنگاو، ڕەواقی هەنگورینییە بەوچەشنە پەروەردە دەکرێ: لەناو سەوەتە ترێیەکیدا، کە چەند هێشووێکی ساخیێ هێشووەکانی جوواییەمز دەکرێنەوە ئەوانی تریش دەکوشرێن و گلووە ترێیەکیش بە سەر قونچکی هێشووە ساخەکانەوە دەکرێ و هێشووەکان لە شیلەی ترێ کوشراوەکان هەڵدەکێشرێ ئەوجار لەسەرەخۆ لەنێو کوپەیەکی دادەنرێن و شیرەی ترێ کوشراوەکەی تریشی بە سەردا دەکرێ و بە و چەشنە سەری دادەپۆشرێ تا دووسێ مانگان هەڵدەگیرێت، کە دەرهێنرا ترێ و شیرەکەی کەمکەمە دەخۆن وە تا ئەندازەیێکی مرۆش سەرخۆش دەکات، دەڵێن لە ترێی قرمزی دروست دەکرێ و کیلۆ یەکیشی سرکە تێدەکرێ کە لێی چێژرا و زۆرترش بوو کەمێکی ئاویشی تێدەکەن.

**ڕەنگاوڕەنگ:** ڕەنگامە، ڕەنگین، نەخشین.

**ڕەنگاوی:** ڕەنگین.

**ڕەنگە:** وێدەچێ، وەهایە، وەهەیە، واگوماندەبرێ، لەگینە، لەوانەیە، دەگونجێ، شایانە: ــ دیدەنێکی سابلاخێ بکەم تانەمردووم.

**ڕەنگەرزیلە** (هـ.): گوڵەعەمرۆکە.

**ڕەنگبەس:** بایەدارکردنی ڕەنگ.

**ڕەنگ بەستن:** بەربەستکردنی ڕەنگ بۆ نەچوونەوەی. سەرگرتنی کاریک؛ ئەم کارە ڕەنگی بەست، واتە جێگیربوو.

**ڕەنگ بەنەفش:** بنەوشی ڕەنگ.

**ڕەنگپەریگ:** ڕەنگپەریو، ڕەنگ نەماگ، کاڵە و پووگ.

**ڕەنگپەرین:** ڕەنگ گۆڕان، ڕەنگ زەرد هەڵگەڕان. تێکچوونی ڕەنگ و دیمەن لە ترسان یا لەبەرنەخۆشی. کاڵبوونەوەی ڕەنگی چتێ، ڕەنگ نەمان، کاڵەوبوون.

**ڕەنگ پەریو:** زەرکی، قەمەرتی، نزار، واریو، کەسێکە ڕەنگی گۆڕابێ.

**ڕەنگپرا** (هەورا.): ڕەنگ پەریو.

**ڕەنگ پیشە:** ئاوەڵکاری شوێن.

**ڕەنگدار:** بە ڕەنگ، ڕەنگین، پڕڕەنگ. ــ ی: ڕەنگینی.

**ڕەنگدانەوە:** گۆڕانی ڕەنگی چتێک.

**ڕەنگرەز:** ڕەنگرێژ، ڕنگکار. ــ ی: ڕەنگرێژی، ڕەنگ کاری.

**ڕەنگرژاندن:** ڕەنگرژتن.

**ڕەنگرژانن:** ڕەنگرژاندن.

**ڕەنگرژتن:** نیشانەکردنی بناغەی خانو بە گێچ یا بە چتێکی تر بۆ هەڵکەندن و بناغەدانەوەی.

**ڕەنگرشتن:** ڕنگرژتن.

**ڕەنگرێز:** ڕەنگرێژ، ڕەنگکەر، مالستە. ــ ی: ڕەنگرێژی.

**ڕەنگرێژ:** ڕەنگرێز، ڕەنگکەر، مالستە، (هەورا.) ڕەنگرێس، ئەو کەسەیە بەن و کران ڕەنگ بکات.

**ڕەنگرێژتن:** ڕەنگرێژی، ڕەنگکردنی بەن و کەر و چنراو و چتی تر.

**ڕەنگرێژی:** ڕەنگکاری.

**ڕەنگزەرد:** پووت، زەرە زەرکی، دوخووز، قەمەرتی، سیچەلۆک، ــ بوون: زلهمین، ڕەنگ پەڕین، ڕەنگ زەرد هەڵگەڕان. ــ ی: پووتی.

**ڕەنگکار:** مالستە، ڕەنگین، ڕەنگ کەر. ــ ی: پیشەی ڕەنگ کردن.

**ڕەنگکەر:** ڕەنگکار.

**ڕەنگ کران:** مەفلین.

**ڕەنگکردن:** مەقلاندن، ڕەنگ لە چتدان، ڕەنگین کردن، ڕەنگاندن. فریودان، کەڵەک لێدان، هەڵخەڵەتاندن.

**ڕەنگ کریاگ:** ڕەنگکراو، ڕەنگین. تەفرەدراو، هەڵخەڵەتاو، خلەتیاگ، فریودریاگ.

**ڕەنگ گرتن:** مەبەس لەسەرگرتنی کارێکییە.

**ڕەنگ مەییک:** نێرەمووک، چوراوچوور.

**ڕەنگوڕەنگ** (ئەردە.): ڕەنگاوڕەنگ.

**ڕەنگ و ڕوو:** چارە، دیم، دیمەن، ڕوخسار، شکڵ، شێوەو ڕەنگی ڕوخسار.

**ڕەنگ و ڕێس:** شێوەی چنین و تەنین، ئەم کرە ــ یێکی جووانی هەیە.

**ڕەنگ وڕیسە:** ڕەنگ و ڕێس.

**ڕەنگهەڵبزرکان:** ڕەنگپەرین لە ترسان یا لە شەرمان.

**ڕەنگهەڵبزرکاندن:** ڕەنگ هەڵگەڕان، ڕەنگ هەڵبزرکیان.

**ڕەنگ هەڵگەڕان:** ڕەنگ زەردبوون، ڕەنگ شێوان.

**ڕەنگهەڵگەڕاندن:** ڕەنگ گۆڕین.

**ڕەنگهەڵگەڕاو:** ڕەنگ پەڕیو. ــ ی: ڕەنگ پەڕیوی.

**ڕەنگێن:** ڕەنگێنەر، ڕەنگکار، ڕەنگکەر.

**ڕەنگێنەر:** ڕەنگێن.

**ڕەنگی ڕوو:** ئاوی ڕوو، ئاوڕوو، ئابڕوو.

**ڕەنگین:** ڕەنگاوڕەنگ، ڕەنگدار، پاراو، جووان وشیرین، چتی ڕەنگاوڕەنگی جووان. نێوی ئافرەتانە. ــ ی: ڕەنگاوڕەنگی.

**ڕەنگی وێگر:** ڕەنگی خۆگر.

**ڕەنوو:** ڕنوو، (سوور.) ڕەنی، بەوپارچە بەفرانە دەڵێن، کە لەبەرقەدی چیای لێژ بەردەبنەوە خوواریێ، (هەورا.) پاسارە، هەرەس.

**ڕەنووس:** لە (٠ تا ٩) ڕەنوسە، ژمارە لە ڕەنووسی پێک دێت، بۆوێنە ژمارە (٢٥) لە دوو ڕەنووسی پێک دێت (٥) و (٢).*

**ڕەنێوهاووردن:** ڕەنێوهێنان.

**ڕەنێوهێن:** ڕەنێوهێنەر.

**ڕەنێوهێنان:** بەکاربردن، حاملاندن، شێن کردن، بەخێوکردن، پەروەردەکردن.

**ڕەنێوهێنەر:** بەکاربەر، ڕەنێوهێن، حاوێن، حاوێنەر، کەرێن.

**ڕەنێوهێنران:** بەکاربران، حاملان، بەخێووپەروەردەکران.

**ڕەنێوهێنراو:** بەکاربراو، حاملاو، بەخێو وپەروەردەکران.

**ڕەنی** (سوور.): گاشەبەردی گەورەیە، کە لە چیایانەوە حاڵە بووبێ، کەوتبێتە خوواریێ. (باد.، مزو.) ڕەنووەبەفر.

**ڕەنید:** ڕەنگ.

**ڕەو:** سڵەمینەوە، ڕەوینەوە. هێرش. قاچ. ــ کردن: قاچاندن، هەڵاتن، ڕەوین، ڕاکردن. (فە.) ڕاو، نێچیرگرتن.

**ڕەوا** (باک.): شە، ئە، شێ. دروست، دورووست، شان، شیان، ڕاست، شایان، شایستە، ڕجوا. نا ــ: نادروست، ڕووشوشتی. بێبرە و ناڕەواج،

کەساس. بڕکردنی فەرمان و دووانی یەکێک، فیسارەکەس فەرمانی ڕەوایە. (دەر.) ڕەگ. (هەورا.) ڕەواج، برەو، ڕەمین.

**ڕەوابوون:** دروست بوون، لێوەشانەوە. ڕێک کەوتن، بەجێهاتن، جێ بەجێ بوون.

**ڕەوابینین:** بەشایان زانین.

**ڕەوادیتن:** ڕەوابینین، بەدروست زانین.

**ڕەواج** (ع.): برەو، ڕەمین، هەرمێن. بازاڕی ـــ: شەهنەدێر. نا ـــ: بێ بازاڕ، کەساد.

**ڕەواد:** ڕەواوی.

**ڕەوادی:** لەسەدەی چاردەمیندا بەو هۆزە کوردە کوتراوە، کە سەلاحەدینی ئەیوبی لێ پەیدابووە ئێستا (ڕاوێنا) یان پێدەڵێن.

**ڕەوار:** بەروبۆ، بەروباو، بەرەجووت، وەرز، خولندۆت.

**ڕەوارتن** (باک.): بەتاڵکردن، تاشین. ڕەندەلێدان، مشت و ماڵکردن.

**ڕەواردار:** پڕێژ، بەروبۆدار.

**ڕەواسە** (هەورا.): ڕێوی. قومەقوم، کەڵەک، کەین و بەین.

**ڕەواق:** ڕینگاو، دووب، دژبە. ـــ ی هەنگوین و قەند و شەکر، (شکا.) دژبیە. بەناوی (رواق الاکراد.) لە میصریێ لە شاری قاهیرە و لە مزگەوتی ئەزهەریدا بۆ خوێندکارانی کورد لەلایەن سەلاحەدینی کوردی ئەیوبییەوە تەرخانکراوە خوێندکارانی کورد بە بێ پارە و تەرک دەتوانن لە وێدا بخوێنن.

**ڕەواقە** (باک.): پەنجەرەی چکۆڵە.

**ڕەواک:** پارچەی چنراوی موویە لە دەورەی ماڵ وگردی خێوەتانی دەگرن.

**ڕەوال** (باک.): ئەسپی ڕەوان. بەهێز، قایم، مەحکەم.

**ڕەواڵ:** منداڵی نێرینەی تووک لێ نەهاتوو، جحێل، لاو. ڕووت، ڕەجاڵ. ڕەوال، ئەسپی ڕەوان و بە هێز و قایم. (ڕەوا.) پاڕەوە.

**ڕەوان** (فە.): گیان، پەرێیرگ. کەسێکە زگی بچێ و گرفتی نەبێ، ڤۆزکەر، زگچوو. مرۆ یا گیان لەبەرێکە لە ڕۆیشتنێدا زیرەک و خۆشەویست بێ، ڕەهوان، ڕەوال، ڕێڤان، ڕێوی، ڕێونگی. بێ گیروگرفت، شل. زانین، تێگەیشتن، ساخکردنەوە، وانەود، وور. ـــ کردن: واتە تێکۆشان بۆ باش زانین و تێگەیشتن. جەلال، کێژین، ڕۆیشتینی ئاو. ـــ بوون: جەلال بوون. ـــ کردن: جەلال کردن، ناردن. گیان. ـــ دار: گیان لەبەر. بێ ـــ: مردوو.

**ڕەوانە:** کل، ڤرێ، وەری، بەرێ. ـــ بوون: وەرێکەوتن. ـــ کردن: وەرێخستن، بەرێکردن، ڕوواندن، کل کردن، هەناردن، هنارن، ناردن. ـــ کردنەوە: گەڕاندنەوە دوواوە، ناردنەوە شوێنی خۆی، داگەڕاندن.

**ڕەوانەبوون:** وەرێکەوتن.

**ڕەوانەکردن:** هەناردن، ناردن، وەرێخستن، بەرێکردن، بەرێکردنی میوانێک، تەک کەفتن، لەتەکاڕۆیین.

**ڕەوانەوە:** ڕەوینەوە، سڵەمینەوە، سڵکردنەوە، لەخۆ را پەڕینی گیان لەبەر. نەمان، جووێ بوونەوە، بەجێهێشتن، زڕان. ـــ ی خەو: زڕانی خەو. ـــ ی دژخین: لەدژخی خۆی دەرچوون.

**ڕەوانبوون:** زانین و خوێندنەوەی چتێک بە بێ گیروگرفت.

**ڕەوانبوون:** زگچوون.

**ڕەوانبێژ:** کەسێکە نووسین و دووانی جووان و ڕەوان بێ، ڕووان وێژ. ـــ ی: جووانی و ڕێکی لە نووسین و دوواندا، شەهتۆتی، دەمەوەری.

**ڕەواندار:** گیاندار، گیان لەبەر. ـــ ی: گیانداری، گیان لەبەری.

**ڕەواندز:** کەلە، کەلات، قەلا، قەلات، دژ، ڕەوان: گیانە. ڕەوان دز: واتە قەلاتێکی، کە ڕەوانی تێدا دەپارێزرێ. واتای دووەمی: ڕەوەندز واتە قەلاتی ڕەوەندان، کە لە هیچ لایەکەوە دزییان لێ ناکرێ و زیانیان پێ ناگەیەنرێ لە پێش ئیسلامیەتدا دژ بووەدووایە (ژ) یە کە بۆتە (ز). شارێکی کوردانە لە نێوان هەولێر و ڕایەتێدایە.

**ڕەواندن:** تەفروتوونا کردن، بڵاو کردن. سڵەماندنەوە، ڕەوان کردن، (باک.) پەکاندن، فڕاندن، ڕفاندن.

**ڕەواندنەوە:** ـــ ی خەو: زڕاندنی خەو. ـــ ی دژخین: لەدژخی خۆیدا نەهێشتن، بڵاوکردنەوە. ـــ ی قوونێر: بڵاوە پێکران، تەفروتووناکردن.

**ڕەوانسەر:** دێیەکی گەورەیە لە ناوچەی ماهیدەشتێدا.

**ڕەوانکردن:** تێکۆشان بۆ زانین و ساخ کردنەوەی وانەو دەور زانینی چت بە هۆی زۆر پێدا چوونەوە. ناردن، ڕەوانەکردن. زگچوواندن.

**ڕەوانگۆیی:** لەر، وان (گیان) دووان.

**ڕەوانن:** ڕەواندن، ڕژیاندن، تاراندن.

**ڕەواننەوە:** ڕەواندنەوە. کلا بوون، بڵاو بوونەوەی هەور و ئیتر.

**ڕەوانوێژ:** ڕەوانبێژ. ـــ ی: ڕەوانبێژی، ڕەوانووتن. زانیاری گیان و ڕەوان.

**ڕەوانی:** ـــ ی ئاو: ڕۆیشتن و ڕەوتی ئاو. زگچوون. ڤۆژ، سەرپێیی، سەر پایی. دەرمانی ـــ: دەرمانی زگچوواندنی. سەرخەر، باڵاڕەو.

**ڕەواوە:** ڕەواوەوە.

**ڕەواوەوە:** ڕەوییەوە، چتێکە لە دژخی خۆی دەرچووبێ وەکوو دژخین لە ناو پزوو چتی تر.

**ڕەوە:** گەلە یەکسمێکە، (جا.) ڕەووگ، (باک.) ڕەوی، کە بریتییە لە ئەسپ و ماین و ئێستر. لیسێکی گەورەیە گەزۆی پێ دەتەکێنرێ.

**ڕەوەڕەو:** وەڕینی سەگ، وەڕەوەڕ، حەپەحەپ.

**ڕەوەز:** شوورێنی سەخت و دژوارە لە چیایاندا، کە سەرکێش بێ، شمشێرەشی پێدەڵێن.

**ڕەوەک** (موک.، ڕۆژ.): کێوی، بزۆز، ترسەنۆک، ڕەوەکی.

**ڕەوەکی:** گیاندارێکە بە دەمی خۆی بلەوەڕێ و شووانی نەبێ.

**ڕەوەلە:** کۆمەڵەی جووجەڵە و چتی دیکەیە، (باک.) ڕەبێکە.

**ڕەوەن:** ڕەوەند، کۆچەر، ڕاڕەو، ڕێ بگار. (ئەردە.) ڕێبووار.

**ڕەوەند:** کۆچەرێکی بێ خانووە، کە گەرمێن و کوێستانێ دەکەن هەمیشە لەناو ڕەشماڵاندان، ڕەوەن. بەبیرو باوەڕی جیگەر خوێن: ئێلێکی کوردە، کە باوکی سوڵتان سەلاحەدین لەوان هەڵکەوتووە فەرمانداراتی دەیسم و کوڕی ئیبراهیم کوڕی حوسێن لەو ئێلە نیە بەڵکوو لە ڕەواد و ڕەوادییە کوردستان و ئازەربایجان لە بندەستی ویدابوون. ـــ ی: جۆورە هەڵپەڕینێکە. کۆچەری، کەسێکە لە ئێلی ڕەوەندبێ.

**ڕەوەوان:** کەسێکە بە داری گوێزی بتەکێنی. ئەوکەسەیە ڕەوەی یەکسمان دەلەوەڕێنێ.

**ڕەوت:** شێوەی ڕۆیشتنی کەو و ئاسک و ئازدار و دڵبەرانە، (هەورا.) ڕۆت، بۆ جورە ڕۆیشتنی چوار پێیانیش بەکاردەبرێ. (باک.): ئەوەرداس

. واتەی پڕوپووچ. قامچی، لێدان. ترس.

**ڕەوتاندن** (باک.): ڕەوراتن، بڕەوتێنە.

**ڕەوتەل**: گێل، بێکارە، بێ ئارمانج.

**ڕەوتەلە** (باک.): گێل، گەوج.

**ڕەوتەڵە** (باک.): گێل، گەوج.

**ڕەوتی**: ــ ی کەوان و ئاسکان: چەشنی ڕۆیشتنیان.

**ڕەوود** (باک.): مێگەل.

**ڕەودین** (باک.): برسی. ــ ی: برسێتی.

**ڕەورەو** (باک.): ڕەورەوەک، بەردە تراویلکـە، سـەراو. ڕارەوە، ڕەوالـە، جوورە ئەسپە دارینە یـا ئاسنینەیە، کـە منداڵان پێی فێرە ڕۆیشتن دەبن، (ئەردە.) پاڕۆکڵە.

**ڕەورەوە**: پێچکی هـەموو چتێکـی وەکـوو ئەسپە ئاسنینە و ترۆمبێـل و عارەبانەیە. مرازێکە ٣، ٤ پێچکییە منداڵی پێ فێرە ڕۆیشتن دەکرێ.

**ڕەورەووک** (زەن.): کرمێکی باریک و درێژە گۆیا درێژایی چل پەنجا گەز پترە لەئاویدا دەژی بەهاران دێتە دەرێ وورە وورێ دەکات. گەرگە. بەردە تراویلکە.

**ڕەوز** (هەورا.): کەنداڵ و قووڵایی بەرقەدی شاخان. کەمینی ڕاوکەران.

**ڕەووز** (ئەردە.): ڕارەو، بکار، ڕێواز، ڕێ، پێلکە، ڕێگا.

**ڕەوەزەنە** (شار.، ڕۆژ.): دەلاقە، کولانەی سەربانی، ڕۆچنە.

**ڕەوسە** (هەو.): کۆمەڵە گەڤێکی سوورە لەسەر جۆخینێ شەنەبا کرابێ و دانەکەی لە کای جوێ کرابێتـەوە، (کـە.) جێژ. (دەر.) ڕفسە، جۆخین، سوور.

**ڕەووش**: شێوە، ڕەفتار، ڕەووشت، دیمەن. (باک.) ڕەونەق و جوانـی چت، خەمڵ، خشڵ، چەک. ــ بوون: خـەمڵین، ڕازانـەوە، ــ کرن: خـەمڵاندن، ڕازاندنەوە. (باد.) شـادمان، کـەیفخۆش. (باک.) سـەردەمی ئێستا لـە ڕێزماندا.

**ڕەوشاندن** (باک.): ڕووناکی دان، بڕەوشێنە.

**ڕەوشەن**: ڕۆشن، ڕووناک. ــ بوون: ڕووناکبوون. ــ کردن: ڕووناک کردن. ــ ی: ڕووناکی.

**ڕەووشت**: کردار، نـەریت، خـوو، ڕەفتـار، یاسـا، هێـم، ئـایین، بانـەک، پرەنک.

**ڕەووشت وخوو**: شێوە و ڕەفتار.

**ڕەووشێ** (باک.): ئێوی ئافرەتانە.

**ڕەوق** (ئەردە.): قەبارە، تیمن.

**ڕەوکەوان**: ڕەوگەران.

**ڕەوکردن**: ڕەوین، هەڵاتن و بە جێهێشتنی جێگایەک لە ترسان یا لەبەر درم و ڕەشەرشانەوە و ئیتر.

**ڕەوگ**: ڕەورگ.

**ڕەووگ** (جا.): ڕەوەی وولاخی بەرزەیە.

**ڕەوگە**: شـوێنێکە لـە نیشـتیمانی یەکەمـەوە بـۆی بچـی و بیکەیـە نیشتیمانی دووەم. (خۆ.) مێوێکـە ترێیـەکی ڕەشی هەیـە زوو پێدەگات. (خۆ.) کەسێکە شوێنەواری پیری زوو لێ دەرکەوێ.

**ڕەوگـەوان** (ئـەردە.): ڕەووگـەوان، ڕەوەوان، کەسـێکە ڕەوەی وولاخـی بەرزەی بلەوەڕێنی.

**ڕەونە** (ئەردە.): ڕەووندە.

**ڕەونەق**: برەو، هەرمێن. ئارینگ، ئاو، ئاوی ڕوو. ڕووناکی، ڕەوشەنی.

**ڕەونـەقدار**: ڕوونـاک، ڕەوشـەن. بـەبرەو، بەهـەرمێن. ــ ی: ڕوونـاکی، ڕەوشەنی، برەو، بەهەرمێن.

**ڕەوونج**: ڕەقیتە.

**ڕەووندە**: ڕێبووار.

**ڕەوی** (باک.): ڕەوەی وولاخی بەرزەیە.

**ڕەویان**: ڕەوین، ڕەوینەوە.

**ڕەویانەوە** (ئەردە.): ڕەوانەوە، ڕەوینەوە. بڵاوبوونەوەی هەور، ڕەوینەوە.

**ڕەویەت** (شا.): ڕەووشت، خوو.

**ڕەوێتن** (زا.): تاشینی چت.

**ڕەوێژەک** (باک.): ڕەنە، تیغێکی کەوانەییـە نـاوی کـەوچک و کاسـەی داری پێهەڵدەکۆڵرێ. ڕەندە.

**ڕەوێشک** (باک.): مرازێکە چتی پێ بەتاڵ دەکرێ.

**ڕەویشک** (بابا.): ڕەندە.

**ڕەوێڵە**: ڕێچکە، ڕێز.

**ڕەوێڵەی قەتار**: ڕێچکەی قەتار.

**ڕەوێژەک** (باک.): ڕەندە.

**ڕەویـن** (بـاک.): (بـاک.) ڕەوارتـن، بڕەوێنـە، ڕەڤین، ڕاکـردن، هـەڵاتن، دەرباز بوون، قاچاندن، ڕەوکردن. وەڕینی سەگ.

**ڕەوینە** (ئەردە.): ڕەوەن، ڕێ بگار، ڕاڕاو، ڕۆیندە.

**ڕەوینەوە**: سـڵەمینەوە، ڕەویانـەوە، ڕەمـین. (بـاک.) ڕەوی. ــ ی دۆخین: کرانـەوە و بـڵاو بوونـەوەی پەزووی دەرپـێ و سـەرین و قـەفی گۆچـان. ــ ی قوونـێز: بڵاوبوونـەوە و نـەمان. ــ ی خەو: خەو زڕان. ــ ی هەور: بڵاوبوونـەوە و نەمانی و لاچوونی.

رەویشک

**ڕەه** (باک.): ڕەگ. ڕیش، ڕدێن. (زا.) پەی، ڕیشە.

**ڕەها** (باک.): ناوی پێشووی ئورفەیە. ئازاد، بەرەڵا. چتی ڕایی. (زا.) ڕەک. ــ نی: ڕایی، ڕزگاری، بەرەڵایی. ــ بوون: ڕایی بوون، بەرەڵابوون. ــ کردن: ڕایی کردن، بەرەڵاکردن، ڕزگارکردن. ــ یی: ئـازادی، بـەرەڵایی.

**ڕەهەستن** (باک.): شەرفرۆشی کردن.

**ڕەهەل** (باک.): جیازی بووکان.

**ڕەهەنە** (کە.): مشەخت، دەربەدەر، تەرە، وێڵ.

**ڕەهبەر**: ڕابـەر، کەسـێکە پەیام یـا ڕاسپاردەی کەسـێکی بـە کەسـێکی تریگەیەنێ. ــ ی: گەیاندنی پـەیام یـا ڕاسپاردەی کەسێکی بـە یـەکێکی تر.

**ڕەهت** (باک.): ماندوو. ــ کرن: پەکی کاری کەسێکی خستن.

**ڕەهتی** (باک.): کارتێکدان.

**ڕەهدین** (باک.): ڕدێن، ڕیش.

**ڕەهرەو**: ڕارەو، ڕێبووار. ــ ی: ڕێبوواری.

**ڕەهندە** (کە.، بابا.): ئاوارە، مشەخت، دەربەدەر. ـــ یی: ئاوارەیی، دەربەدەری.

**ڕەهوال** (باک.): ڕەوان، وانەی ـــ: وانەی ڕەوان، ئەسپی ـــ: ئەسپی ڕەوان.

**ڕەهوان**: ڕەوان. وانەی ـــ: وانەی ڕەوان. ئەسپی ـــ: ئەسپی ڕەوان، ئەسپی خۆشڕەوت.

**ڕەهێسیابۆ**: لاسکی گیایەکی تامخۆشە لەناو ماستی دەکرێ.

**ڕەهیل** (هەورا.): بەڕەڵا.

**ڕەهێڵە**: شەس، لێزمە، شەستە بارانە، (ڕەوا.) ڕەهێر، ڕێژنەبارانە، ڕهێڵە، بارانەی لێزمە و بەخوڕ و توند. ئەو بارانەیە، کە پلووسکان وەدەنگ بخات.

**ڕەهێڵ بوون**: لنگە و قووچ بوون.

**ڕەهێڵ خستن**: لنگەو قووچ خستن.

**ڕەهێڵ کردن**: لنگەو قووچ خستن.

**ڕەی** (ئەردە.): ئەندازە، ئەنازە. (بۆتا.) ڕەگ. (ئەردە.) پێز، هێز، کێش.

**ڕەیگرتن**: ئەندازە گرتن، پەی بە ئەندازە بردن.

**ڕەیلە** (کە.): ڕەوەڵە.

**ڕەینەق** (فە.): ژێر ئەژنۆ.

**ڕەیین** (باک.): بڕەیە، وەڕین، ڕەوینی سەگ.

**ڕب**: (ئەردە.): ڕووب، شیرە، ڕیچاڵ، ڕیچۆڵە، مرەبا، ڕچاڵ.

**ڕباب**: کەمان، کەمانچە مرازێکی ساز و ئاوازە.

**ڕبات**: کەرێکە بۆ بانگ کردنی کەوان بەکاردەبرێ. (باک.) شووێنێکە ئاژاڵ و مالاّتی بە شەو لێ دەلەوەڕێ.

**ڕباس**: زەوی دێران لە پێش چاندندا، کەشاو.

**ڕباسە** (باک.): بڕوانە: ڕباس.

**ڕبانەک** (باک.): تاکەدار، دارێکە تەنهابێ.

**ڕبە**: ناوی ئەندازەیێکی دیاری کراوە بۆ پێوانی دانەوێڵە وەکوو: تەغار، وەزنە، مەن، کەوێژ، بریتییە لە پێوانەیەکی، کە شەش مست دانەوێڵە و نیدیکە دەکاتە ڕبەیەک، (خۆ.، زرا.، هەو.) کۆڵ، کەویژ، (هەورا.) کەوچ. دەفرێکە دانەوێڵەی پێ دەپیورێ، (ماوە.) جامەڕبە.

ڕباب

**ڕبەل** (باک.): باسکلاوە، ڕێواسی کلاوبنە، ڕێواسێکی گەلاپانە ئەویش لەنێو گەلایەکانیدا دەڕوێ، (هەورا.) قەلاّقینگ.

**ڕبەنار**: ڕب و دۆشاوی هەناری کوشراو، سرکە.

**ڕبک** (باک.): موور.

**ڕبێدە** (کۆ.): سووت، مردە.

**ڕبیس** (باک.): جوورە گیایەکە.

**ڕپارپ** (باک.): تەقەتەق و دەنگی قاپقابییە، (باک.) ڕقارق. ڕپەڕپ.

**ڕپانن** (باک.): تەقەوڕەقە کردن.

**ڕپەڕپ** (دەر.): تریەترپ.

**ڕپن**: باقەیێک لە گیا. (باک.) ڕیشە. ـــ دان: ڕیشە داکوتان، (زا.) پنج داکوتانی گیا.

**ڕتانخ** (سا.، دۆس.): کرتۆپە، یارەڵماسی، خرکە گازۆڵە.

**ڕتام** (باک.): تۆز، خۆڵەمێش. ـــ ی: تۆزاوی.

**ڕتل** (بابا.، زا.): گون. (باک.): لیتر.

**ڕتلۆ** (زا.): قۆڕ، گونک.

**ڕتمانندن** (باک.): پڕکردن.

**ڕتمین** (باک.): پڕبوون.

**ڕتورۆیین**: شێوە بە ڕێگایەدا ڕۆیشتن؛ ئازاد ـــ ێکی جوانی هەیە.

**ڕجاڵ** (شن.): دۆشاوێکە بە لەچەکی تێدابێ.

**ڕجرجاندن** (باک.): هاڕین، وورد و خاشکردن. برووچینە: ووردیکە.

**ڕجرجین** (باک.): هاڕ ڕان، وورد و خاش بوون، سوور بوونەوەی شووێنێک لە ئەندام لەگەڵ زەرد بوونی بە هۆی لێدانی یا کەوتنی چتێک بەنهێم.

**ڕجل** (کە.): هێز، توانا، ووزە. ـــ م بڕیا: ووزەم نەما.

**ڕجن** (باک.): بیریشکی پلاوی.

**ڕجوا**: ڕەوا؛ مامۆستا کاری وای بەمن ـــ نەدیت.

**ڕجوابینین**: ڕەوادیتن.

**ڕجوادین** (ئەردە.): ڕەوابینین، بەشایان زانین.

**ڕجووک** (باک.): جوورە ماسییەکە.

**ڕچ** (ئەردە.): سەهۆڵ، بستەڵەک، بەستەک. (کە.) کووێرەڕێ. (کە.) لەسەرمان سڕبووەوە. سەڕەتا.

**ڕچاڵ** (باک.): مرەبا، ڕیچۆڵ، ڕب.

**ڕچان**: بەستنی بەفر و ئاو بە هۆی زۆر ساردییەوە.

**ڕچاندن**: بەستن و مەیاندنی چتی تەڕ بە هۆی سەرماوە.

**ڕچانن** (ئەردە.): ڕچاندن.

**ڕچاو** (کە.): لەسەرمان سڕ و ڕەق هەلاّتوو.

**ڕچە**: باریکە ڕێگایەکە لەناو بەفرێدا کرابێتەوە بۆ پێدا ڕۆیشتنی گیان لەبەران، بەفرەسەر، ڕێچکە، باریکە ڕێ، باریکەڕێگای ناو بەفر، شاو، شەهوو، شقیلە، ڕەچە، ڕچەڕێ. بەفرێکە بەستبێتی، بەفرەسەر.

**ڕچەڕێ**: ڕچە، باریکە ڕێگا.

**ڕچەشکاندن**: باریکە ڕێگا کردنەوە لەناو بەفرێدا.

**ڕچەشکاندن**: مەبەس لە کردنی کارێکییە، کە چاوی لێ بکرێ.

**ڕچە شکانن**: ڕچەشکاندن.

**ڕچەشکیان** (ئەردە.): ڕچەشکان.

**ڕچەکوتانن**: ڕچەشکاندن.

**ڕچەکوتیان**: ڕچە کردنەوە، باریکە ڕێگایەک لەناو بەفرێداکردنەوە.

**ڕچقاوە** (کە.): ڕپیۆقی چاو.

**ڕچکە** (کە.): باریکە ڕێگایەکە.

**ڕچیان** (خا.): ڕچان، بەستن، سڕبوون لەسەرمان. بەستنی ئاو، بوونەسەهۆڵ، بەستەڵەک، بەستوو.

**ڕچیاو**: ئاوی سارد. بەستراو.

**رچین:** بوونه سەهۆڵی ئاو لەبەر تەووژمی سڕی وسەرما.

**رچیو:** چتی بەستوو لەبەر سەختی سەرما.

**رحا:** بڕوانە: ڕها.

**رحان** (باد.): ڕێحانە، ڕیان، ڕیۆن.

**رخاوتن** (خۆ.): مرۆ باش داپۆشین و کەناری لێفە و جاجمەکەی باش نوشتاندنەوە. (خۆ.) هەویر باش داپۆشین.

**رخە** (جا.): ئاڵەکۆکەریخنە، شەڵوار بە کوڵ، گیایەکە بۆ ڕەوانی زۆر باشە وەکوو ئاڵەکۆک وایە.

**ردوان:** شارێکی کۆنی کوردانە لە ناو خەزرا (فارەقین)، ئاوی ــ دەچێتە سەر زێی دەجلەی.

**ردۆز:** ڕژژ.

**ردێ** (باک.): پۆ (لە جۆلاییدا).

**ردێن:** ڕیش، ڕندێن، ڕوە، ڕه، ڕهدین.

**رز** (کە.): ڕیز، دەستەیەکە لە تەنیشت یەکتری هێلێ بن.

**رزان:** داڕزان، ڕزین، (باک.) ڕزیان، ڕچکان، پەخشان، پەتشان، (باک.) پورتکان، هەڵوەرین، داوەشان، دافەتان.

**رزانەوە:** داڕزانەوە، دافەتانەوە.

**رزانـدن:** داڕزانـدن، دافـەتاندن، داوەشـاندن، ڕچـەکاندن، هـەڵوەراندن، پوورتکاندن، بێزەوەرکردن، پوواندن، هەلاهەلاکردن.

**رزانـدنەوە:** داڕزاندن.

**رزانن:** ڕزاندن، هەڵوەراندن.

**رزاو:** داوەشاو، دافەتاو، بێزەوەر، پوورتکاو.

**رزە** (باک.): ئاڵقەڕێز.

**رزەژیلکە** (هەورا.): گلێرە.

**رزەک** (ئەردە.): ڕزۆک.

**رزەڵ** (ئەردە.): مەردومی کەنەفت و ڕزیوە.

**رەزەڵخووا:** بۆخودا.

**رزەڵۆک:** چتێکە لەبەر ڕزیوی لە خۆیەوە هەڵدەوەرێ.

**رزدە** (زا.): ئاڵقەڕێز. (باک.) زنجیرە بـەردی خۆڕسکی چیـاو گـرد و بەندەنان.

**رزق** (بابا.): داعبایەکی سپییە لە مشکی گـەورەتر لـە سمۆرە گچکەترە، ڕسق، بانبانک. (کە.) مشکە کوێرە، جرج، ڕزک.

**رزک** (کە.): مشکەکوێرە، جرج. (گەر. بار.) تێکوڵـە شینەکەی گوێز و بادامییە.

**رزۆک:** جووره مێوژێکـە ووشـکەڵ و کرمـی تێـدا بێـت. جـووره مێـوژو کشمیش و ترێیەکە ڕزیبێ.

**رزگار:** قوتار، دەرباز، تیلە، ئازاد، ڕەها، گیانداریکە لـەچورتمێک ڕزگار بووبێ. ــ بوون: نەفدین، قوتار بوون، بەرشین، پەڕینەوە، لەکۆڵ بوونـەوە، فـەلتین، دەرچوون، دەربـاز بوون، وەسـەرکەوتن. ــ کـردن: قوتـارکردن، پەڕاندنــەوە، ڕاپـەڕاندن، دەربــاز کــردن، فــەلتاندن، ئــەفراندن، لەکۆڵکردنەوە. خۆ ــ کردن: ڤەرسین.

**رزگارکار:** ڕزگاریدەر. ــ ی: ڕزگاریدەری.

**رزگار کەر:** ڕزگار کار.

**رزگارگە:** پەنا، پەسیو، دالدە، جێگای ڕزگاری.

**رزگاری:** دەرچوون، قوتاربوون، هێوان، دەرباز بوون لە گێچەڵ و چورتم.

**رزگاری خوواز:** سەربەستی خوواز.

**رزگاری خووازتن:** سەربەستێتی خووازتن.

**رزگاری خووازی:** سەربەستێتی خووازی.

**رزن** (ئەردە.): قەتارە، ڕێچکەی چت، هاوقەتار، هاوپۆل، هاوپایە. دێڕ.

**رزۆت** (خۆ.): ڕزۆک، پووچەڵ.

**رزۆک** (خـۆ.): پووچـەڵ، ڕزۆت، قریـۆک، هـەڵوەرۆک، دەنکـە تـرێ یـا مێوژێکە لە ووشک بوونەوەدا ڕزا بێ و ترش و نـاخۆش بـوو بێ یا کرمی تێدا بێ.

**رزێنە:** داڕزێنەر.

**رزی:** ڕزیوە، ڕزیوەتەوە. ڕزیو، پورتکاو.

**رزیاگ:** ڕزیو، داوەریو، داوەریگ.

**رزیان** (ئەردە.): ڕزین، وەرین، داوەرین، وەرینی تووک و ئیتر. هەڵوەرین، وەرینی گەڵای داران و ئیتر. هەڵوەرینی موو.

**رزیانک** (باک.): ڕازیانە.

**رزیانگ** (باک.): گیایەکە، ڕازیانە.

**رزین:** داڕزان، پۆرتکان و لە کارکەوتنی چتێک لەبەر کۆنی.

**رزیو:** چتی پۆرتکاو.

**رژ** (باک.): سـەڵت، هـەژار، بێکەس، بێ کابـان. جـووره هـەنجیرێکی کێوی، ڕژک گچکەی وییە. (باک.) ڕژی، ئاگری کوژاوەوە.

**رژاک** (هەورا.) بەردەمردە، بـەردی ئاسک و ڕزیو، بەردێکـە هـەڵبوەرێ سا پان بێ یا نا.

**رژان** (هەورا.): مجیای، ڕشان، ڕێژان، قڵپ بوونەوە، ڕژیان، دەرنخووین بوون، داڕژان، پەرش و بڵاو بوونـەوەی دانەوێڵـە یـاچتی شـل. تـێ ــ: چوونەناوەوە، بەرەڵابوونی ئاوی گۆزە و بارانە و ئیتر.

**رژانیـەک:** تێکـەڵ یـەکتر بوونـی دوو دەســتەی گـەورە. تێکچـرژان، پێکهەڵپرژان.

**رژانـدن:** پـەرش و بـڵاو کردنـەوەی دانەوێڵـە یـا چـتی شـل. ڕێژانـدن، وەرگێڕاندن، وەرگێڕان، ڕژتن، ڕشاندن، قڵپ کردنەوە، ڕشتن، ڕێژنـای، ڕهتن، ڕێتن، ڕیتن، تێرژاندن: دارژتن، پڕکردن.

**رژانراوە:** ڕژێنراوە، دانەوێڵە یا چتی شلی بڵاو بووەوە.

**رژانن:** ڕژاندن، ڕژتن، ڕشتن، بۆ ئاوو خووێن و شلەمەنی دیکە.

**رژاو:** ڕژای، ڕژاو، بەرەڵا بوونی ئاو.

**رژای** (خۆ.): ڕژاو.

**رژتن:** ڕژاندن، ڕشتن، (هەورا.) ڕێژنای، ڕهتن، ڕیتن، ڕێتن، چاو ــ: کل لە چاو کردن.

**رژد** (بابا. جا. ئەردە.): کـەنس، نـەگریس، دەست ووشـک، بـەر چـاو تەنگ، پنتی، لەچەر، قرنووس، چەپخووس، بێچـەڵم، پیشوە، چرووک، پیسکە. ــ ی: چکۆسی، سـاتوولی، بەرچاوتـەنگی، چرووکی. (باک.) دانە چەقینەی هەوجاڕ لە زەوی. چیرە، شێرگیر، شێلگیر، سوور.

**ڕژدبوون:** بەرچاوتەنگ بوون، چاو پێ هەڵنەهاتن.

**ڕژدکردن** (ئەردە.): باڵاکردن، بەرزبوونەوە، هەڵچوون.

**ڕژدی:** چکۆسی، ساتوولی، بەرچاو تەنگی، چرووکی.

**ڕژک** (باک.): لە (ڕژ) گچکە کراوەتەوە، هەنجیری کێوی. دانە، دەنک، قڵ.

**ڕژی** (باک.): بێ مەزە، لاواز، چێشتی بێ ڕۆن. ڕەژی، ڕەژوو، خەڵووز. (ڕەوا.) پیت، ڕێژەو، فەر، بەبرپار.

**ڕژیاگ:** ڕژاو.

**ڕژیان** (ئەردە.): ڕژان.

**ڕژیانەیەک:** تێکچرژان، ڕژانەی پاڵ یەکتری.

**ڕژیاو:** ڕژاو.

**ڕژیتی** (باک.): بێ مەزەیی، لاوازی.

**ڕژین:** ڕژان.

**ڕس** (کە.): ڕەشمە، ڕستەی تاژیانە، ڕست، قایشێکی درێژ و باریکە لە ملی تاژیان دەکرێ لە کاتی دیاردی کردنی کەروێشکدا لە ملی دادەماڵرێ و لە کەروێشکەکەی بەردەدرێ. ڕستە، تەناف. بەرموور، ڕستەی مووروروان.

**ڕسان** (هەورا.): ڕووان، ڕوویین.

**ڕسانەوە:** گەڕانەوە ماڵ. خۆ ڕزگار و قوتار کردن.

**ڕساندن** (باک.): پێوەنووساندن، پێوەچەسپاندن.

**ڕسەر** (هەر.): مەڕێکە سەروملی بۆر و لەشی سپی بێ. (باک.) مەڕێکە سەری سپی بێ.

**ڕسەر بەلەک** (هەر.): مەڕێکە سەروملی بۆر و لەشی سپی بێ بەڵان خاڵی ڕەشی لە لەشیدا بێ.

**ڕسەر شین** (هەر.): مەڕێکە ملی مەیلەو شین بێ و سەروڕووی ڕەش و لەشی سپی بێ بەڵان پەڵەی شینی لە لەشیدا بێت.

**ڕست:** تەمەن، ژی، تەنها بۆ تاژی بەکاردەبرێ: تاژیەکەت چەند ڕستە: تەمەنی چەندە. (باک.) دروشمی شانازی و سەر بڵندییە. ـــ کرن: ڕازاندنەوە، ڕەنگی شلەمەنی ڕەنگدار. (باک.) پاڵپێوەنەر.

**ڕستە** (باک.): ڕشتەی زێڕی، ـــ ی گەوهەری، ـــ ی مووروو. ڕشتە، ڕستەک، (کە.) ڕست، ڕستک، هەوساری تاژییان. ڕستەی میوەی ووشک کراوەوە، زەرزەنگ. تەنافێکە جلک و کاڵای تەڕی لەسەر هەڵدەخەن بۆ ووشک بوونەوە، گوریس. هەرشتە. گردە.

**ڕستەک** (هەو.): ڕستەی ڕەشماڵان.

**ڕستەی** (هەورا.): ڕووان.

**ڕستبوون:** ڕووان، دەرچوون.

**ڕستک** (باک.): قەلادە، ڕستە، ڕشتە، گەردنبەند. تەناف. ـــ کردن: هۆنینەوە، بە ڕستەوەکردنی مووروو و ئیتر. ڕستە لەملی تاژیان کردن بۆ ڕاوێ.

**ڕستگ** (باد.): ڕستە، تەناف.

**ڕستگار:** ڕزگار. ـــ بوون: ڕزگار بوون. ـــ ی: ڕزگاری.

**ڕستن:** ڕێسان، (باڵە.) پەشتن، بادانی لۆکە و خوری و موو بەتەشی یا خەرەک تا بکرێتە دەزوو یا بەن. دەرگای گڕ و گێچەڵ نانەوە، زۆر تاخەفتن. لەسەر ڕۆیشتن، درێژە پێدان.

**ڕسق** (هەورا.): ڕزق، جرج، بانبانک، مشکی گەورە، ڕسک.

**ڕسک:** بڕوانە: ڕسق.

**ڕسکان:** هەنگووین و ئاوی تەماتە و چتی وایە، کە لە زستاندا پەیت بووبێ و بەسترابێ. دەوڵەمەند و ساماندار بوون. مرۆ یا گیان لەبەرێکە زۆر بەهێزو پتەو و قەڵەو بووبێ. بۆ دار و گژوگیا و هەموو گیان لەبەرێکی دەبێ، کە پتر و زۆرتر بووبێ، هەڵکەوتن، گەشەکردن، پێگەیشتن، ڕووان، کە پەیوەند کرابێ.

**ڕسکاندن:** خۆ گرتنی خەڵفی دارانە دووای پەیوەندکرانی.

**ڕسکاو:** خۆگرتن، خەڵفێکە پاش پەیوەندکردنی خۆی گرتبێ و پەیوەست بووبێ.

**ڕسگار** (ئەردە.): ڕزگار، ئازاد. ـــ کردن: ڕزگار کردن، ئازاد کردن. ـــ ی: ڕزگاری، ئازادی.

**ڕسم** (خۆ.): بەردێکە بەشی زۆری لە زەویدا بێ و کەمێکی لەسەر زەوی دیار بێ.

**ڕسیان** (باک.): پێوەنووسان، چەسپ بوون.

**ڕشان:** ڕژان، بەرەڵابوونی ئاو.

**ڕشانەوە:** ئازارێکی پیسە لە خواردنەوەی ئاوی پیس تووشی دێن، (فە.) مەرگی، چاوقووڵکە، ژەهر کەنگر دەرمانێتی. پەڕپەلک و گەڵا بوونی دارانە. هەڵهاووردنەوە. قەڕشان، (باک.) دلغەلینەک، هێنانە خوارەوەی خواردەمەنییە بەزاردا، هێڵنج هاتنەوە یا هێنانە خۆ بۆ ئەوەی، کە خواردەمەنی ناو زگ بەزاردا بێتە دەرەوە. قوزە، کە تووک و گوڵ و کوڵکەکەی بوەرێنێ لە پێش خڕبوونیدا دەڵێن ڕشاوەتەوە. بۆ هەڵوەراندنی گوڵی داروبار و گیایانیش بەکاردەبرێ.

**ڕشاندن:** ڕژاندن، بەرەڵاکردن، ئاوڕشێنکردن. ـــ ەوە: قەڕشاندن.

**ڕشاندراو:** ڕژانراو، ڕژێنراو.

**ڕشت** (هەو.): هەوجاڕ وا لێ بکرێ، کە نووکی گاسنەکە قیت و باش زەوی بگرێ. هەوەسی ئیش و کارکردن، ئارەزووی کارکردن.

**ڕشتا** (باک.): هەرشتە.

**ڕشتە** (کە.): ڕستەک، دوومەاهک، ڕستە، کشتەک، بەند. زنجیرە، زریزە. حەگاڵ. (ئەردە.) هەرشتە، ڕشدە.

**ڕشتە پلاو:** هەرشتە پلاو.

**ڕشتن:** ڕژتن، ڕژاندن، چاو ـــ: تێوەڕینان، کل لە چاو کردن بە کلچێوک.

**ڕشتنەوە:** مەیداندانی مەردوم بۆ تێوەر دانیان لە کارەساتێکیدا: باییز ئەم شارەی ڕشتەوە.

**ڕشتی:** ڕشدی. (لو.) ڕشدە، هەرشتە، ڕشتە.

**ڕشقەن** (ئەردە.): قەشمەری.

**ڕشقەنەجاڕ** (ئەردە.): قەشمەر جاڕ.

**ڕشک:** گەرای ئەسپێ ومۆریانەیە، بێچووی ئەسپێیانە، نووتک. تۆزقاڵ، تۆسقاڵ، ئاستەم. (باک.) ڕق، قین، چاوپێهەڵنەهاتن، خانی دەفەرمووێ: ڕشکاتەیە غیرەتی حسوودان.

**ڕشکه** (باک.): هەرشتە.

**ڕشکدار**: ڕشکن. ـــ ی: ڕشکنی.

**ڕشکن**: ڕشکدار، بەڕشک، ڕشکاوی، کەسێکە زۆر ڕشکی لە پۆشاکیدابێ.

**ڕشمە** (باک.): هەمموو ئەندامێکی گومبەزییە. نیری جووتی یە. ڕەشمە. خشڵی ژنان.

**ڕشنا** (فە.): ڕووناک. ـــ هی: ڕووناکی.

**ڕشوان**: ئێلێکی گەورەی کوردە.

**ڕشیایۆ**: ڕشانەوە.

**ڕشێن**: ئاپرژێنکار، کەسێکە نانی ڕەق برشێنێ بۆ نەرم کردنەوە.

**ڕشێنە**: بارانێکی زۆر سووکە، کە تەنها ئاپرژێنی زەوی بکات لەسەرەخۆ.

**ڕشێنەر**: ڕشێن.

**ڕشێنەوە**: دەرمانی ڕشانەوە، دەرمانێکە مرۆی برشێنێتەوە.

**ڕف**: دێراوێکی درێژە لە قەراخ زێییەدا بۆ تڕێژوو. (کە.) زۆبڕین و کۆڵین بە بێڵ. ـــ لێدان: بێڵ باش لە زەوی دا گرتنە خوارەوەیە. ـــ لێدە: بێڵەکەت باش بە زەویدا ڕۆبە خوارێ.

**ڕفاندن**: ڕاڕفاندن، ڕاوناندن، ڕەپێ نان، هەلانن، ڕەڤاندن، (باک.) ڕەوانـدن. (هەورا.) ئەرفای، (هەو.) قەپاندن، چڕسانن، تراڤانن، پەلاماردانی چتێک و بردنی بە دەست و برد.

**ڕفانن**: ڕفاندن.

**ڕفە**: ڕفحە.

**ڕفت** (باک.): باریک وناسک.

**ڕفتن**: دڕین، ڕێگا کردنەوەی ئاوێ یە.

**ڕفت و ڕێژ** (ئەردە.): ڕیان و میزتن.

**ڕفحە**: (هەورا.) ڕەفە، (هەو.) تاخچە، (هەو.) ڕفکە، (بابا.) ڕفە، تاقەییەکی بڵندە لە نێو دیواری ژوورانـدا بۆ چت لەسەر دانانی.

**ڕفسە** (دەر.): ڕەوسە، جۆخین سوور، خەرمان.

**ڕفک** (شێخ.): سەمەندۆک.

**ڕفکە** (خۆ.): حەوزی ئاوییە.

**ڕفۆک** (هەو.): پسووخ، چتێکە ڕزیبێ و هەڵبوەرێ، کەندالێکە لێوارەکەی لەبەر ڕزیوی هەر لە خۆڕا بڕووخێ.

**ڕفیاگ**: فڕێنراو.

**ڕفیدە**: (هەر.، هەورا.) مادە، مەزرەکە.

**ڕفێن**: ڕفێنەر، قەپێن، ئەو کەسەیە چتی برفێنێ. ڕاوەنەر، ڕەپێنەر، ڕاڕفێنەر.

**ڕفێنەر**: ڕفێن، قەپێن، ئەوکەسەیە، کە چتی برفێنێ.

**ڕفێنران**: فڕێندران.

**ڕفێنراو**: ڕاونراو.

**ڕفێنراو**: تیژهەڵگیراو.

**ڕفین**: ڕووخان، ڕمانی بەرد و چیا و سەربان دیوار و نیتر، (هەورا.) ووڕین.

**ڕڤین**: فڕین، باڵگرتن. (باک.) گر، ڕووناک. ـــ ی: ڕووناکی.

**ڕق**: وورک، نگە، گجگ، عنجک، کینە، کووڤان، ئەرناڤ، پیش، پشم، ڕۆڤ، ڕۆڤک، قین، کین، ڕک، دەخەز، ماد، ئەرن، پرووشە، کەرب، جەنە، غەید، توندی، تووڕەیی. بە ـــ : ڕقدار، مەڕس، دڵپڕ.

**ڕقا** (باک.): شارێکی کوردانە لەسەر چۆمی فوراتێ لە هێلا جزیرێیە هەر وەکوو لەناوشاریدا کورد هەن لە باکووری وێش کورد زۆرن.

**ڕقارک** (باک.): ڕەقەڕەق.

**ڕقاوی**: ڕق ئەستوور.

**ڕقەئەستوور**: دڵتاریک، دڵپڕ، دەخەزدار، (باک.) بێ بەزەیی، ئەرنۆ، کینۆ. ـــ ی: دڵپڕی: دەخەزداری.

**ڕقەبەری**: پالوور، بەربەرەکانی، ڕکەبەری، قینەبەری، لەگەڵ یەکتری بەرەنگار بوون، لەداخی یەکتری کارێک یا ڕێگایەک خستنەبەر. ـــ کردن: بەربەرەکانی کردن.

**ڕقەستوور**: ڕقن، ڕکن، قیندار. ـــ ی: ڕقداری، قینداری.

**ڕقکێشان**: ڕق هەڵگرتن لەدڵدا بەرانبەری یەکێکی.

**ڕق جوونەوە**: لەسەر ڕق ڕۆیشتن.

**ڕق جووین**: ڕق جوونەوە.

**ڕقخواردنەوە**: پیشخواردنەوە، ددان بە جەرگی خۆداگرتن و پشت لە ڕق کردن و گوێ پێنەدانی لەکاتی ڕق هەستانێدا.

**ڕقدار**: غەیدۆک، نەهارەزگ، دڵپڕ، قیندار، مەڕس، ڕق ئەستوور. ـــ بوون: دڵپڕبوون، قیندار‌بوون. ـــ کردن: دڵپڕکردن، مەڕسکردن.

**ڕقرقۆک**: خرەخر و خشەخشی کالای تازە. (باک.) ڕپاڕپ، تەقەتەق، قرچەقرچی شکانی دارو نیتر. ووشک.

**ڕق گرتن**: تووڕەبوون، جەنەگرتن، قین هەستان و دانەمرکانەوەی مرۆ.

**ڕق لەزگ**: کەسێکە ڕقی لەدڵیدابێ.

**ڕق لەسک**: ڕق لە زگ.

**ڕق لێکێشان**: ڕقەبەری کردن لەگەڵ یەکێکی.

**ڕق لێهەڵگرتن**: وەزگدان، ڕق لە دڵ گرتن لە یەکێک بۆ تۆڵە لێکردنەوەی لەدەرفەتێکیدا.

**ڕقن**: ڕق ئەستوور، ڕقاوی.

**ڕق نیشتنەوە**: (باک.) بەنجین، ئەرناڤ لێچوون.

**ڕق هەستان**: ڕق هەڵستان، توند و تووڕە بوون.

**ڕق هەستاندن**: ڕق هەڵستاندن.

**ڕق هەڵسان**: ڕق هەڵستان.

**ڕق هەڵساندن**: ڕق هەڵستاندن.

**ڕق هەڵستان**: چەلتین، خەزرین، هەڵتڕین، قینەوەهاتن، گەوی، ڕکاهەلانین.

**ڕق هەڵستاندن**: بۆنگ کرن، مادکردن، چەلتاندن، ڕق هەستاندن، ڕق هەڵساندن، (باک.) بەنجادن، شەق پێبردن.

**ڕك** (ئەه.): جێگای هەوراز و لێژ وسەخت. گوریسێکی درێژی پڕ ئاڵقەکراوە سەری بەرخ و کاریلان دەئاڵقەکان دەکرێت تادایکیان نەمژن یا بۆ بەستنەوەیان یا بەنێکە لەملیان دەکرێ تانەمژن. (باک.) پێداگرتن،

**ڕێگەبەرنیان** (ئەردە.): ڕێگانانەپێش، ڕێنیشاندان، ڕێگاخستنەپێش، ڕابەری، ڕێبەری.

**ڕێگەخستن**: خستنەڕێ، بەڕێکردن، ڕەوانەکردن.

**ڕێگەڕۆیین**: ڕۆیشتن، ڕێگەبڕین.

**ڕێگەکەفتن**: کەوتنەڕێ، وەڕێکەوتن.

**ڕێگەگومکردن**: ڕێ بزرکردن، گومڕاهی، سەرلێشێوان، حەپەسان.

**ڕێگەگیر** (ئەردە.): ڕێگر، جەردە، چەتە. ـــ ی: ڕێگری، جەردەیی، چەتەیی.

**ڕێگەنما**: ڕێگەنوێن، ڕێنما، ڕانامە.

**ڕێگەنوێن**: ڕابەر، ڕێبەر، ڕێ نیشاندەر.

**ڕێگەنیشاندان**: ڕابەری، ڕێبەری، ڕێنواندن.

**ڕێگەنیشاندەر**: ڕێگەنوێن.

**ڕێگەوبان**، ڕێگاوبان.

**ڕێگەی تەنگ**: تەنگەڕێ.

**ڕێگەی ڕاست**: ڕاستەڕێگە.

**ڕێگەی سەخت**: سەختەڕێ، چەتمن، ڕێگای دژوار، ڕێگای بەردەلان.

**ڕێگەی کاکەشان**: کاکەشان.

**ڕێگەکوتیاگ**: ڕێگای خۆشکراو، ڕێگەی چاکراوە.

**ڕێگەی کێف**: ڕێگایەکە، کە بەنێوانی دووکێواندا یا بەسەر کێویدا تێدەپەڕی، ڕچەی کێوان.

**ڕێگر**: نەهێڵ، مەیدان نەدەر، ڕێنەدەر، نەهێژ، پاگیر، ڕێگر، ڕێنەدەر، جەردە، تەریدە، گۆران، چەتە، تەتەر.

**ڕێگرتن**: نەهێژتن، نەهێلان، ڕێنەدان، ڕێگیری، جەردەیی، تەتەری.

**ڕێگری**: جەردەیی، تەریدەیی، تەتەری، ـــ کردن: جەردەیی و چەپاوکردن، ڕێگرتن.

**ڕێگۆ** (باک.): ڕێبەر، ڕابەر.

**ڕێگومکردن**: ڕێ وونکردن.

**ڕێگیر**: نەهێل، ڕێگر، ڕێنەدەر.

**ڕێگیری**: نەهێژتن، ڕێنەدان، نەهێلان. جەردەیی.

**ڕێل** (باک.): لێڕەوار، جەنگەڵ. ڕێژنە بارانە بەدەم باوە، بۆران. (فە.) کەشتی.

**ڕێلاندن**: (باک.) وەعەوعەوخستن، وەڕاندن.

**ڕێ لەبەرچوواندن**: ڕێ پێ بڕین بەئاسانی.

**ڕێ لەبەرچوون**: گەیشتنە قۆناخ، ڕێبڕینەوە بەئاسانی.

**ڕێلەخۆ** (هەورا.، خۆ.): ڕیخۆڵە، ڕیخەڵوو.

**ڕێلستان** (باک.): لێڕ، لێڕەوار، جەنگەڵ، (باک.) ڕێل، دارستان.

**ڕێلی** (باک.): گێووژ.

**ڕێلین** (باک.): وەڕین، عەوعەوکردن.

**ڕێن** (دەر.): (هەورا.) ڕان، مێگەل. (باک.) ڕدێن، ڕیش.

**ڕێناس**: ئاشنای ڕێگا، بەڵەدی ڕێگا. (باد.) ڕۆنیاس.

**ڕێنامە**: بەرنامە.

**ڕێنەبەر** (باک.): مەشقی پێشمەرگان. ـــ ی: مەشقکردنی پێشمەرگان.

**ڕێنج** (کۆ.): گیایەکە هەر ئاژاڵێکی بیخوا پێی دەمرێ. ڕەنج. شوێن، ئاساوەر. گرم گیابڕ.

**ڕێنجبەر**: ڕەنجبەر. ـــ ی: ڕەنجبەری.

**ڕێنجۆ**: (باک.) گزج.

**ڕێنک**: ئەو تووکەیە لە بەرخی ساوا دەکرێتەوە. لەڕی، لاوازی، بێهێزە.

**ڕێنکە** (ئەردە.): کۆبوونەوەی چەند کەسێک یا ئـورێدوو، کەلەترسان نەوێرن بڕۆن.

**ڕێنکەدان** (ئەردە.): کۆمەڵبوونی گیاندار، کۆبوونەوە، جەنجاڵی، مەنەرکردن، گردەوەبوون.

**ڕێنگ**: ڕینگ. خورییەکی کورتە، کە لە پێست دەستڕن کرابێ.

**ڕێنگاڵ**: (ئەردە.) ڕنگاڵ.

**ڕێنگانەوە**: ڕێنگەڕینگ کردن. دەردانی ڕێنگاڵە لە چتی شیلەدار! هەنگوینەکە بخەرە سەرسەبەتەکە با بڕینگێتەوە.

**ڕێنگە**: ڕنگە، پرتە، بۆڵە.

**ڕێنگەڕێنگ**: ڕنگەڕنگ، زۆر پرتەپرتکردن.

**ڕێنگ ڕێنگکەرە**: ڕنگە ڕنگکار، پرتەوبۆڵەکار.

**ڕێنما**: ڕێگانوێن، نیشانەیێکە لە کەنار ڕێگا دادەنرێ بۆ پێشاندانی ڕێبوار، شارەزاکار، ڕێگانیشاندەر. ـــ یی: ڕێنواندن، ڕێگانیشاندان، ڕێنوێنی، ئامۆژگاری.

**ڕێنۆبەری** (باک.): جوورە بووزوێکە.

**ڕێنووس**: نووسەوەری، نژوە.

**ڕێنوێن**: ڕێ نیشاندەر. ـــ ی: ڕێنیشاندان.

**ڕێنێر**: (باک.) چاوەڕێ. ـــ ی: (باک.) چاوەڕێیی. ـــ یاکرن: چاوەڕێیی کردن.

**ڕێنیشان** (باک.): دەستوور، ڕێزمان، دەهکەر، بناغە، ڕاستەک.

**ڕێنیشاندان**: بەڵەد و ئاشناکردن.

**ڕێنیشاندەر**: ڕابەر، ڕێبەر، پێشڕەو. ـــ ی: ڕابەری، پێشڕەوی، ڕێبەری.

**ڕێو** (ئەردە.): کەڵەک، گێچەڵ، فێڵ.

**ڕێوار** (ئەردە.): ڕێبوار.

**ڕێواز** (ئەردە.): ڕێباز، ڕێپێلکە، ڕەووز، بکار، شووێنی پێدا ڕۆیشتن.

**ڕێواس** (ئەردە.): (هەورا.) ڕیواو، (باد.) ڕێڤاس، گیایەکی کوێستانی گەڵاپانەو بەهارییەو نێرتکەکەی پاک دەکرێت و دەخورێ زۆر مزرو خۆشە. بنەکەی بەتەری بکوڵێنن و بیپاڵێوون و سبەینان بخورێ بۆ چیکڵدانەو بیوەسیری و زگ ئێشە وددانی ڕەش زۆرباشە.

**ڕێواسی**: مام ڕێواس، گیایەکی کوێستانی بەهارییە و گەڵاپانە گەڵای وەهی (گەڵاقنگ) دەچی بەلام نەم لاسکی ڕێکترە، گەڵایەکانی بۆ کوژتنی کرم زۆر باشە دەکرێتە شۆربا.

**ڕێواسی قوڵەبنە**: (ئەرگو.) شاوێری، (بار.) بەنگەڕی، بەنگێڕی، جوورە ڕێواسێکە گەڵای پانە.

**ڕێوان**: پاسەوانی ڕێگا. ـــ ی: پاسەوانێتی ڕێگایە.

**ڕێواوی** (هەورا.): ڕێواس.

**ڕێوبان**: ڕێگاو دەوروبەری، ڕێگایەکە، کە هاتوچۆی بەسەردا بکرێ.

**ڕێورا**: ڕێوڕاست.

**ڕێوڕاست**: ڕاستەوخۆ، ڕاستەوڕێ، ئەگەر و ابڕۆی ــ دەگەیەشوێنی دڵخواز، ڕێوڕێ.

**ڕێوڕێ**: ڕاستەوڕێ.

**ڕێوشوێن**: یاسا، خوو و ڕەوشت، پلان، نەخشەی چت.

**ڕێوونکردن**: سەرلێشێوان.

**ڕێوونگی** (باک.): ڕێبووار.

**ڕێوی**: (باک.) ڕووڤی، هۆرێشە، ڕۆڤی، ڕیوی، (هەورا.) ڕوواسە، (فە.) ڕوو، رووی، گیانداڕێکی کێوی چوارپێی تووکنی کلک فشی گووێ قوتی فێڵبازە لە کەروێشک زلترە. (باک.) ڕێبووار. ــ پێچ: فێڵ و ساختەو تەڵەکە.

**ڕێهەسن**(باک.): ڕێی ئاسن.

**ڕێهەڤ** (باک.): هاوڕێ، هاودەم. ــ ی: هاوڕێیی.

**ڕێ ئاسن**: ڕێهەسن.

**ڕی**: (فە.) ڕوو. ڕێگا، ڕێگە. (یەز.) ریش، ردێن.

**ڕیئەوڵە** (فە.): گرۆێ، ئاوڵەدار، خورێرکەدار. ــ یی: گرۆیی، ئاوڵەداری.

**ڕیا**: ڕووپایی، مەرایی، ڕووالەت، کلکەسووتە، زمانلووسی، دووڕوویی.

**ڕیاکار**: ڕووپایی کار. ــ ی: ڕووپایی کاری.

**ڕیاڵ**: جوورە پارەیێکی زێوینی گەرمێن و کوێستانێ بووە.

**ڕیان** (هەورا.): ریحانە، (هەورا.) ڕیوێن. ڕین، ڕیتن، گووکردن، فیراندن.

**ڕیاندن**: ڕاداشتن، پیسایی پێکردن.

**ڕیایی**: ڕیاکاری، ڕووپایی.

**ڕیە**: (باد.): ریش، ردێن.

**ڕیەسپی** (باد.): ریش سپی.

**ڕیپ**: (باک.) فێڵ، تەڵە، داو، تەفرە، (ئەردە.) تەکان.

**ڕیپاڵ**: شل و شۆڵ، پیس و چڵکن، شڕۆڵ، بێجێ، قەڵتەبان، شڕوشڕۆڵ، بێشەرم، (هەورا.) ڕووت، بێسامان.

**ڕیپەبردنەوە**: مردن، لەناوچوون.

**ڕیپۆ** (باک.): فێڵمزان، فێڵباز.

**ڕیپۆق**: (هەورا.) گوژاو، چڵکی نێو کەپوو چاوانە، ڕچقاوە.

**ڕیپۆکار** (باک.): فێڵمزان. ــ ی: فێڵمزانی.

**ڕیپۆگەر** (باک.): فێڵمزان. ــ ی: فێڵمزانی.

**ڕیپۆڵ**: پۆخڵ و بێکارە. کالای شڕوووڕو هەلاهەلا.

**ڕیت** (ئەردە.): فێڵ، تەڵەکە، کەڵەک، (فە.) ڕووت لە بۆ مرۆ نەبێ بۆ هەموو گیانلەبەرێکی تر بەکاردەبرێ، (ئەردە.) تەکان، (ئەردە.) شڕەوکۆنە.

**ڕیتاڵ** (باک.): گەڕیدە، ئاوارە، هەرزەگەرد. شیاکە.

**ڕیتاڵە** (هەورا.): شیاکە.

**ڕیتاڵی** (باک.): گەڕیدەیی، ئاوارەیی.

**ڕیتە**: چتێکە کەل و پەلی خوری پێدەشۆررێ.

**ڕیترش** (فە.): ڕووترش، مۆن. ــ ی: ڕووترشی، مۆنی.

**ڕیتق** (فە.): جیقنە، ڕیقنە، ڕیق، مرخ.

**ڕیتق چەم** (فە.): ڕیپۆقی چاو.

**ڕیتک** (ئەردە.): ڕیت، شڕە، کۆنە.

**ڕیتکە**: کەمێک هەویر ترش و ئاردە، کە ڕۆژێک پێش هەویر کردنێ بە ئاو دەگیرێتەوە بۆ سبەینێ، کە هەویریان گرتەوە دەیکەنە مایە و هەوێنی، فریشک.

**ڕیتک و پیتک** (ئەردە.): پڕوپیت، ڕیت و پیت، خرت و پرت، شڕەوبڕە.

**ڕیتن** (باک.): ڕژتن، ڕژاندن، ڕهتن. ڕیان، گووکردن، ڕین، (باک.) سووک بوون.

**ڕیتوپیت**: (ئەردە.) ڕیتک و پیتک.

**ڕیجە**: ڕێژە.

**ڕێچ** (کە.): ددانەچیرە، ددان لە چیرەوەبردن. ددانی گڕ، مرۆی ددان گڕ.

**ڕێچاڵ** (زا.): مرەبا، ڕوب، میوەی پەروەردەکراو لەنێو شیلەی شەکریدا.

**ڕیچاڵ** (باک.): ڕب، مرەبا، ڕێچۆل، شیریژێکە، کە کەنگری تێکرابێ، گوڵی سەری ڕێواسییە، خۆراک و پێخۆرێکە برێتییە لە پەنی رو شیرێژ و شیرو سەرتوو.

**ڕیچە**: ڕێژە.

**ڕیچەڵۆک** (بابا.): بنەچەکە، ڕەچەڵە، کەتەنها لە جنێواندا بەکار دەبرێ، بەــ ی دا چووەخووارەوە.

**ڕیچەوکردن** (ئەردە.): ڕێچکردنەوە، چیرەوکردن.

**ڕیچبوونەوە**: ددان چیرکردنەوە، چاوبزکردنەوە لە یەکێک.

**ڕیچک** (باک.): ڕیخۆڵەی ئەستوور.

**ڕیچکردنەوە**: ڕیچبوونەوە.

**ڕیچۆڵ**: ڕیچاڵ، مرەبا، ڕوبی هەر چتێکی بێ.

**ڕیحانە**: ڕووخانۆکە، مۆر، (هەورا.) ڕیان، (هەو.، کۆ.) ڕیوێن، گیایەکی گەڵاپانی بۆنخۆشی سەوز و ڕەشە دەستچێن و کێویشی هەیە.

**ڕیحانە فەقێ یانە**: خۆڵ وسەر.

**ڕیحانەکێویلە**: ڕیحانەی خۆڕسکە باڵا بەرزو بۆنخۆشە گەڵایەکانی لەهی ماڵی ووردترن.

**ڕیخ** (جا.، فە.): زیخ، خیزی درشت، چەو، چەفت، لم، لیم. شیاکە، زیچ، کۆخە، پیسایی ڕەشە ووڵاخانە بەتایبەتی، کە شل بێ.

**ڕیخاوی**: ڕیخن.

**ڕیخەخۆرە**: باڵندەیەکە هەر زیخی دەخوا.

**ڕیخەڕەشە**: نەخۆشییێکی ئاژاڵ و ڕەشە وولاخانە پێی دەفیرێنن.

**ڕیخەڵان**: (جا.، دەر.) زیخەڵان، شوێنێکە چەفت و زیخی درشتی زۆر بێ، شوێنێکیشە شیاکەی زۆر تێدابێ.

**ڕیخەڵۆک**: ڕیخۆڵە، ڕیوەڵۆک، (هەورا.) ڕیخەڵوو، (خۆ.) ڕیوی.

**ڕیخەڵوو** (هەورا.): ڕیخۆڵە.

**ڕیخزار:** خیزجار، زیخستان.

**ڕیخن:** ڕیخاوی، پیسی گەمژ، گیانداری پیس و چەپەڵ.

**ڕیخناوی:** ڕیخاوی.

**ڕیخنە:** ڕیخن. ڕیپۆق.

**ڕیخۆڵ** (هەورا.): ڕیخۆڵە.

**ڕێخۆڵاکۆرە** (هەورا.): ڕیخۆڵە کوێرە.

**ڕیخۆڵە:** ریڤینگ، ڕیخەڵوو، ڕێخەڵۆڵە، (باک.) ڕۆدی، رووڤیسۆر، رووخەڵە، ڕیوی، (لو.) لیخەڕوو، (باک.) پنۆر، پزوور، ریڤی، (ئەردە.) ڕیندوڵی جلکی شڕ، چتێکی باریکی درێژە لەزگی گیاندارانداا پیسایی پێدا دەڕوات.

**ڕێخۆڵە ئەستوورە:** ڕیچک، رووڤیرەش، زەبلەک، ڕیخۆڵەییێکی ئەستوورە بەدەم ڕیخۆڵەی باریکەوە.

**ڕێخۆڵە باریکە:** ڕێخۆڵەیەکە لەپێش ڕیخۆڵەی ئەستوورەوەیە.

**ڕێخۆڵەکۆرە:** ڕیخۆڵە کوێرە.

**ڕیخۆڵە کوێرە:** ڕیخۆڵەکۆرە، ماسولکەکوێرە، ڕێخۆڵەییێکی گچکەیە بە ڕیخۆڵەی گەورەوە نووساوە، کە چتی بچێتە ناوەوە زوو فریای نەکەون مرۆی دەکووژێ.

**ڕیخۆڵەی ئەستوور:** ڕیخۆڵە ئەستوورە.

**ڕێز:** قەدر، ریز، پەرای، ڕاژە.

**ڕیز:** جۆق، پۆل، تیپ، سان، چەند چتێکە بە قەتارە و بەڕێز ڕاوەستابن، لە ـــ دان: لەساندان.

**ڕیزبوون:** ڕێزبونی چەند چتێک بە دروستی.

**ڕیزپێوەکردن:** بەرێزهاتن بەسەر چەند چتێکیدا بەبێ بوواردنیان.

**ڕیزرۆ:** ڕێژرەو، قەتاری ڕێگای ئاسن.

**ڕیزکردن:** دانانی چەند چتێک لە تەنیشت یەکتری بەرێز.

**ڕیزکێن:** ڕێزێن.

**ڕیزگاو:** ڕێژگاو. ـــ ی: ڕێژگاوی.

**ڕیزلێگرتن:** ڕیزپێوەگرتن. ڕێزلێنان، ڕاژەگرتن.

**ڕیزلێنان:** ڕێزلێنان.

**ڕیزلێنیان:** ڕێزلێنان.

**ڕیزێن:** یاری سێ ڕێزکێن یا نۆ ڕێزکێن کردن.

**ڕیس:** ڕێسراو، خوری، لۆکە یا موویەکی بەتەشی یابە خەڕەک ڕێسرابێ، چەند گلۆڵە بەنێکە، کە بۆ جاجم و بەرماڵ و ئیتر ئامادە کرابێ. (کە.) ڕێس.

**ڕیسە:** ڕستن.

**ڕیسپی:** (هەورا. باک.) ریشسپی، پیاوی گەورە و بەڕێز، دەمڕاستی ئاوایی.

**ڕیسوا:** ئابڕووچوو، ترۆ، بەدناو، (هەورا.) ڕووسیاو، بێ ئابروو، بێشەرم، هەتک کراو. ـــ بوون: ئابڕووچوون. ـــ کردن: ئابڕووبردن. ـــ یی: بەدناوی، بێ ئابڕوویی، ئابڕووچوون، ترۆیی، (هەورا.) ڕووسیاوی، ڕووسوواوی، بێشەرمی.

**ڕیسو گوریس:** مەبەس لە کردارو ئاخفتنێکی دوورو درێژە، دەڵێن ئەمن تووانای بیستن و یاکردنی ئەمـــەم نیە.

**ڕیسوو:** (بل.) ئەوگیایانەیە، کەپەل بە زەویدا بلاوبکەنەوە. بۆ هەموو جوورە گیایەکیش بەکاردەبرێ، کە بابدرێ بۆ خوواردنی زستانیی وولاخ و ئاژالان.

**ڕیسی** (زا.): باقەگیای ووشک، (باک.) پووت، گژوگیا.

**ڕیسین** (ئەردە.): ڕستن.

**ڕیش:** ردێن، رە، روە، رهدین، رندێن، رێن، پیاو و نێری و بزن ڕیشیان هەیە. (باک.) برین، کولکی حەڵەبێ، زیپکە. (باک.) نیری جووتی.

**ڕیشاڵ:** ڕیشووی بەربووەوەی چتی دڕاوە.

**ڕیشاڵ ڕیشاڵ:** چتێکی زۆر دڕاوە، کە ڕیشاڵی زۆر بێ.

**ڕیشاڵە:** ڕیشاڵ.

**ڕیشالۆ:** داروشاو، ڕنراو. (بار.) جەحفەری، گیایەکی دەستچێنەو دەخورێ.

**ڕیشالۆک** (رەوا.، بار.): تەرخوون، جەحفەری وەکوو تەرە تیزە وایە، (رەوا.) بیزەروو.

**ڕیشە** (هەورا.): ڕیشوو. (هەورا.، کە.) رەتەوە، بنج، پنج، گۆنج، بێخ، بنچینە، رەگ، ڕپن، زنج، مە بالڤان ئانی: ئێمە ڕیشەمان دەرهێنا، لە ـــ هەڵکەندن: لەرەگ و بنچینە دەرهێنان و شەلپین، ـــ داکوتان: زنجداکوتان، ڕیندان، ـــ کێشان: کوژتن، کاروبار تەواوکردن. رەگو دەماری ڕووەکان (دار و گیایان)، گووز، لەرزانە. ڕیشو، ڕیشۆڵە، ڕیشی. دارێکە ساوایە، کە بە ڕیشەوە دەرهێنرابێ و لە شوێنێکیتر چەقێنرابێ یا بچەقێنرێ، شەتڵی داران.

**ڕیشەبڕ:** قڕان تێخەر، بنبڕ، بێخبڕ، بنەبڕ.

**ڕیشەبن:** چتێکە لە پنجو بن هاتبێتە دەرەوە.

**ڕیشەبڕبوون:** لەبن هاتن و بڕانەوەی خێزان یا تیرە یا هۆزێک.

**ڕیشەبن:** بنبڕ، ڕیشەبڕ.

**ڕیشەدار:** ڕیشوودار.

**ڕیشەدارکردن:** ڕیشوودارکردن.

**ڕیشەداکوتان:** رووان و رەگ و بیخ داکوتانی ڕووەکان، جێگیربوون و دامەزران.

**ڕیشە دەرهاتن:** زیانکردن و کەنەفت بوونی یەکێک.

**ڕیشە دەرهانین:** کەنەفتکردن و تووشی دەردەسەری کردنی کەسێکی.

**ڕیشە دەرهاووردن:** ڕیشە دەرهێنان.

**ڕیشە دەرهێنان:** لەرەگ و ڕیشەوە هەڵکەندن، کەنەفت و پەرێشانکردنی کەسێک.

**ڕیشەڕیشە:** ڕووش ڕووش، ووردەی قاقەز و دار و ئیتر.

**ڕیشەکەش:** ڕیشەکێش.

**ڕیشەکەن:** ڕیشەکێش. ـــ کردن: ڕیشەکێشان.

**ڕیشەکێش:** ڕیشەکەن، گیاندار یا ڕووەکێکە، کە لە رەگ و ڕیشەوە دەرهاتبێ.

**ڕیشەکێشان:** ڕیشەدەرهێنان.

**ڕیشەکێشکردن:** لە ڕەگ و ڕیشەوە دەرهێنان.

**ڕیشەمێو:** بنمێو.

**ڕیشەورەتەوە:** ڕەگ و ڕیشە، نەژاد، بنەچەک.

**ڕیشە هەڵبەستن:** ڕیشوو هەڵبەستن.

**ڕیشەی جەرگ:** منداڵ. بندڵ، بەندی دڵ.

**ڕیشەی جیگەر:** منداڵ.

**ڕیشبابا:** (موک.) جوورە ترێیەکە سوورو سپی هەیە. ــ ی سپی: جوورە ترێیەکی سپییە دەنکی هەیە گلووی کەمێک درێژەو بۆ مێلاق دەبێ. ــ سوور: جوورە ترێیەکی سوورە دەنکی هەیەو گلووی درێژەو بۆ مێلاق دەبێ.

**ڕیشباوا** (ئەردە.): ڕیشبابا.

**ڕیشخەن:** تیز، قەشمەری، تیتاڵی.

**ڕیشدار:** بەڕیش، خاوەند ڕیش و ڕدێن. ــ ی: خاوەن ڕیش، ڕدێنداری.

**ڕیش سپی:** ڕیسپی، کوێخە پیاو، دەمڕاست، گەورەی ئاوایی.

**ڕیشک** (باک.): قوونێر.

**ڕیشگاو:** ڕێژگاو. ــ ی: ڕێژگاوی.

**ڕیش ماشو برنج:** ڕیشێکە ڕەش و سپی تێکەڵاو بووبێ.

**ڕیشوە:** ڕیشوو.

**ڕیشۆ** (کە.): پەست خوو، ڕژد، سەربزێو، پیسکە.

**ڕیشۆڵ:** (ئەردە.) ووردەی دار و قاقەز و ئیتر.

**ڕیشۆڵ:** ــ گەرماوی، ڕیشوو، ڕووشاڵ، ڕووش، ڕیشۆڵە.

**ڕیشـۆڵە:** گـاوانی، هەزارداسـتـان، سـێرـوو، باڵندەیـەکی ڕەشـی کونجـی دندوک باریک و درێژە لە چۆلەکە گەورەترە بەگەلێ جۆر دەخوێنێ.

**ڕیشوو:** (هەورا.) ڕیشە، (دەر.) ڕیشی، تاوی بادراوی ئاغە بانوو شەدە و ئیدیکەیە.

**ڕیشووهەڵبەستن:** (باک.) پاشتن.

**ڕیشی** (هەورا.): ڕیشووی شەدە و جامەدانی و ئیتر.

**ڕیشی** (باک.): نیری جووتی، گوریس.

**ڕیشیان** (هەورا.): داڕووشان.

**ڕیشیاندن** (ئەردە.): داڕووشاندن.

**ڕیف** (باک.): بەر، وەکوو مـن ــ ێن خۆ تراشی: هەروەکوو ئەمن بەری خۆم تاشی.

**ڕیفی** (زا.): ڕیخۆڵە.

**ڕیفیک** (باد.): ڕیخۆڵە.

**ڕیق:** چتی نەرمە لیقەی تەنک.

**ڕیق چەم:** (ئەردە.) ڕیپۆقی چاو.

**ڕیق مرخ:** (ئەردە.) جیقنەی مریشکی.

**ڕیقنە:** جیقنە، جیق، گووی باڵندانە.

**ڕیقنە:** ڕیپۆقی چاو.

**ڕیقنەسپیلکە:** جیقنەسـپیلکە، نەخۆشیەکی مریشکانە چەند زیپکەیەکی سپیان لەنێو زاری دێت چارەی زۆر دژوارە بـەڵام ئەوەشی بـۆ بـەکاردەبرێ: سالیسیلات ٨ ئاو ١٠٠٠، پرمەنگەنات ٢ ئاو ١٠٠٠.

**ڕیق و فیق:** چتی زۆر تەنکی نەرمەلیقە، لاواز، لەڕ، سیس، چرچ.

**ڕیقووڵە:** چتی ڕەقەڵە، ووشک و لاواز.

**ڕیـک:** بـڕادەی ئاسـن، ووردەی ئاسـن لەپێشـدا وەکـوو قاقـەزی مـژۆک بەکاردەبرا، کە بە سەر نووسراواندا دەکرا زوو ووشکی دەکردەوە.

**ڕیکە:** کیڕە، چیڕەی ددان یا پێنووس، چیڕە.

**ڕیکەڕیک:** چیڕە چیڕ.

**ڕیگ:** چتی ووردی بریسکە دارو بەسەر نووسراواندا دەکرا بۆ ووشککردنەوەی.

**ڕیگی بیابان:** جوورە لیمێکە لە دوورەوە دەبریسکێتەوە وەکوو ئاو.

**ڕیل:** ژاڵە.

**ڕێڵە خوو دوڵمە:** مووار، زەونەگ، زەونەج، دۆڵمەی ڕیخۆڵەی ئاژاڵان، کە بەبرنج و قیمەو چەوری پڕ دەکرێتەوە.

**ڕین** (فە.): ڕۆن، ڕیتن، ڕیان، (هەورا.) دەنگدانی سەگ.

**ڕیندۆڵ:** تڵیش، ڕیوێر، تیتۆڵ، ڕندۆڵ، بزگوڕ، (ئـەردە.) شیتاڵ، ڕیـواڵ، ڕینگۆڵ، پەڕۆ و جل و بەرگی کۆن و دڕاو.

**ڕیندۆڵڕیندۆڵ:** تڵیش تڵیش، تیتۆڵ تیتۆڵ، پارچەپارچە، شڕو ووڕ. ــ بوون: شڕو ووڕبوون. ــ کردن: شڕو ووڕکردن.

**ڕینگ** (ئەردە.): شیرە، شیلە، ڕینگال، ڕب.

**ڕینک:** لیک.

**ڕینگال** (ئەردە.): ڕینگ.

**ڕینگان:** بۆڵە و پرتەکردن.

**ڕینگاندن:** بۆڵە و پرتەکردن.

**ڕینگاندنەوە:** ڕینگاننەوە، بۆڵە و پرتەپرتکردن، ووتنەوە.

**ڕینگاو:** (هەو.، هەورا.) لیک. ڕەواقی هەنگووین.

**ڕینگە:** منگە، مینگە.

**ڕینگە ڕینگ:** مینگەمینگ، ژاوەژاو، زۆر لەسـەر چتێـک ڕۆیشـتن.

**ڕینگخورما:** شیرەی خورما.

**ڕینگۆر** (هەورا.): سەگی تووکن، کسۆکی تووکدرێژ، بەتووکە درێژەکەی سەگیش دەڵێن.

**ڕینگۆڵ:** ڕیواڵ، شیتاڵ، شڕە، ڕیندۆڵ.

**ڕینگوول** (دەر.): کۆنە، جلی شڕوشڕۆڵ، ڕندۆڵ، تیتۆڵ.

**ڕیو** (ئەردە.): کەڵەک، فێڵ، ڕاووڕیو.

**ڕیوار** (ئەردە.): ڕێبوار.

**ڕێواڵ:** ڕندۆڵ، ڕیندۆ.

**ڕیواو** (هەورا.): ڕێواس.

**ڕیواوی** (هەورا.): ڕێوی.

**ڕیوە:** ڕنگە، ڕینگە. گای بەڵەک.

**ڕیوەڕیوە:** ڕینگەڕینگە.

**ڕیوەڕیوەکەر:** ڕنگەڕنگکەر.

**ڕیوەڵە:** لەڕولاواز (بۆگیاندار).

**ڕیوەڵۆک** (هەو.): ڕیخۆڵە. (باد.) شەمتریکە، هەنگوینی جووره زەرگەتەیەکی.

**ڕیوەن:** بنکی ڕێواسییەکە دەدرێ بەمرۆڤان بۆ ڕەوانی، ڕیۆن.

**ڕیۆن:** ڕیوەن، (هەورا.) ڕیان، ڕیحانە.

**ڕیوێر** (کۆ.): ڕیندۆل، جلکی شڕ.

**ڕیوی:** (شکا.) ڕێوی، رووس. (خۆ.) ڕیخۆڵە. ـــ کاری: ڕێویاد، فێڵبازانە.

**ڕیوینگ** (باک.): ڕێبوار، (باد.) ڕێڤینگ.

**ز:** تیپێکی ئابێی کوردییە.

**زا:** زاگ، زادە، رۆڵە، منداڵ. (کە.) هەند، چەندان. ـــ یەکم لەزگدا بێت: هەند یا چەند چەندانم لەزگدا بێت. وەند، منداڵ. کوڕ، کچی برا و خوشک و خاڵ و مام وئیتر و لەگەڵ وانیش نەبێ بەتەنهایی بەکارنابرێ: برازا، خوشکەزا، خاڵۆزا، ئامۆزا. کرداری ڕابردووە لە زان و زایین وەرگیراوە واتە مێیینەکە زا ـ زاوە، زائی، دی. پس، بەچکە، ئەم ئافرەتە ـــ یێکی لەزگدایە: واتە دووگیانە.

**زائین:** زایین، زان. دەردان، دەڵاندنی ئاو و تەڕایی. ڕوودان، سەرهەڵدان، پەیدابوون.

**زاب:** دوو زێی ناودارن لە کوردستانی عیراقێدا. ـــ ی بادینان سنووری خاکی کرمانج و سۆرانە.

**زابەند:** پەڕاوێکە، کە هەرناوی منداڵی تازەبووی تێدا بنووسرێ. (باک.) تۆماری سەرژمێری. ـــ کردن: تۆمارکردنی پەڕاوی سەرژمێری.

**زابۆق** (باک.): خڕ، خەرەند، کە ئاو دریبێتی.

**زابووق** (زا.): سەرگوویلک، سەرانگوویلک، سەرەنوویلک. دۆڵ و دەرەیەکە ئاوی باراناوی پێدابڕوات.

**زاپ:** ساپ، ساف.

**زاپان:** ساپساپێن، سافسافێن.

**زات** (کە.، ڕۆژ.): زاوەر، ئەترەش. بڕ، پرکێشی، پڕ، ئازایی، زاخ، نەترسان. بە ـــ : ئازا، بەجەرگ. ئازاد زۆر بەزاتە: ئازایە. بێ ـــ : ترسەنۆک، حیز، نامەرد. (فە.) ئەمەگ.

**زاتبردن:** زەهلەبردن، زراوبردن، ترساندن، ووره شکاندن.

**زاتچوون:** زەهلەچوون، زراوچوون. ترسان.

**زاتدار:** زاوەردار، دڵدار. پرکێش، لەخۆڕادیتوو، بۆکە، (هەورا.) بێگەفی، تەبا. (باد.) بەهناڤ. (فە.) ئەمەگدار. چاوقایم، بەجەرگ، نەترس. ـــ ی: ئازایی، پرکێشی.

**زاتکردن:** پرکێشی، لەخۆڕادیتن، ڕووهەڵاوێژتن، ڕووهێنان، وێران، نەترسان لەکردنی کارێکیدا.

**زاج** (هەو.، کە.): پارچەیەکە ڕەنگی بچێتەوە. زاخێکی ڕەشە دەکرێتە ئاو و چەرمی خۆشکراوی پێ ڕەش دەکرێ. (باک.) گەوهەر، (جەوهەر)، ئاوارە. (باک.) ئامادەیی، لێوەشاوەیی. دەرمانێکی سپی تفتە بۆ زۆر چت بەکاردەبرێ بەتایبەتی بۆ ڕەنگ کردنی بەن و خوری.

**زاج و پەرچەم:** پەرچەم و ڕێزە موویەکە بەکەناری سەری کوڕی منداڵدا دەهێڵرێتەوە بۆ ڕێکی و جووانی.

**زاخ:** تاوێری گەورە، بەرد. (هەورا.) زای، چتێکی سپی یا زەردی ترش و تفتە وەک خووێ لە کان دەردەهێنرێ. کەوەرگ، زاخە، ئەشکەوت. (بار.) خڵتەی سەبیلە ومۆدنە. (دۆڵە.) قیر. (فە.) ماه و چیای بڵندە، کە هەمووی بەردبێ. (ڕۆژ.، کە.) ئازایی، زات. بە ـــ : ئازا، زاتدار. بێ ـــ : نامەرد، ترسەنۆک، حیز.

**زاخاو:** دەرمانێکە دەگیرێتەوە بۆ مشت و ماڵی تیغ. زاخە. ئەشوغا، جیلوە، گەوهەر. تیغ کە ـــ درێ، جیلوە و جەوهەر پەیدادەکا بۆیە واناوبراوە. داغ، خەفەت، زووخاو. پاک کردنەوەی خشڵی زێڕ و زێوە لەلای زێڕینگەر.

**زاخاوچاودان:** چاوڕوونکردنەوە بەدیتنی کزی دوژمن.

**زاخاودان:** مشت و ماڵدان، زاخاودانەوە.

**زاخاودانەوە:** مشت و ماڵکردنی تیغانە بە زاخاو.

**زاخاودانی چاو:** تێر تەماشاکردن. کە تێر تەماشای دیمەنێکی خۆش یا ئافرەتێکی جوان بکرێ دەڵێن: هێندێ تەماشای نازەنین خانمی کرد تا زاخاوی چاوی خۆیدا.

**زاخاودەر:** جەوهەردەر.

**زاخاودریاگ:** زاخاودراو.

**زاخە** (موک.): هۆڵی مەڕانە، لەژێر زەوی دروست و چەند ژوورێکی لێ هەڵدەکەندرێ. ژێرزەمین، زاخڕ. (کە.) زەوییەکە پڕ لە بەردەڵان، کە بەکەڵکی چاندن نایەت. لەهەندێک شوێناندا بە مێرگ دەڵێن.

**زاخجووش:** لەحیمی زاخی.

**زاخچەرمگ:** زاخی سپی.

**زاخدار:** مرۆڤی بەسەلیقە و جەوهەردار. تیغی جەوهەردار. ـــ ی: جەوهەرداری.

**زاخڕ:** ئاوی دەرەیەکیە سەرەولێژ بێ. بەردەلان، خیزەڵان. ئەشکەوت، غار، شوێنێکە وەکوو ژوور لە زەوی یا لەچیا هەڵدەکەنرێ بۆ مەڕ و ماڵات، زاخە.

**زاخزەرد:** زاخی زەرد.

**زاخسەوز:** زاخی کەسک.

**زاخۆ:** جووره پاڵتۆیەکە لەبەردەکرێ. ناوی شارێکە لەکوردستانی عیراقێ.

**زاخۆران** (موک.): زۆرخۆر، تێرنەخۆر. ـــ ی (موک.): تێرنەخۆری.

**زاخۆن** (هەورا.): ژێرزەوی، ژووری بنزەوی، زێرزەمین.

**زاخۆیی** (باک.): جووره پاڵتۆو عابایەکە لەپێشدا دەستکاری زاخۆییان بووە.

**زاخوور** (باک.): غار، ئەشکەوت.

**زاخۆران** (موک.): زۆرخۆر، تێرنەخۆر. ـــ ی (موک.): تێرنەخۆری.

**زاخۆن** (هەورا.): ژێرزەوی، ژووری بنزەوی، ژێرزەمین.

**زاخۆیی** (باک.): جوورە پاڵتوو عابایەکە لەپێشدا دەستکاری زاخۆییان بووە.

**زاخوور** (باک.): غار، ئەشکەوت.

**زاخوران**: ناوی دێیەکییە لەنێو هەڤێرکاندا.

**زاخێ**: قشقەڵە، قشقەرە.

**زاخێر** (جا.): دۆڵ و دەرەیێکی لێژ و بەردەلانە. زیخماڵک، خیزەلان، زیخەلان، زاخێران، زاخیر. پارچە زەوییەکە لە دەشتی یا لەداوێن و بەرقەدی چیایاندا، کە ووردەبەردی زۆربێ.

**زاخێران** (دەر.): زاخێر، خیزەلان، بەردەلان.

**زاد**: قووت، تۆشە، زەواد، خۆراک، تێشوو، دانەوێڵە، بژێوی، خواردەمەنی، مایەی ژیان. (باک.) چێشت، شێو، گرار. داهات، دەرامەت، بەروبوو، بەروباو، خوڵندۆت.

**زادە**: مناڵ، منداڵ، ڕۆڵە، وەند، کوڕ، کچ، زا، زاگ، زۆرتر بەتەنێ بەکارنابرێ وەکوو: ئارام ـــ : ئارامزا (کوڕ یا کچی ئارام). بەگزادە (کوڕ و کچی بەگ).

**زادەگان**: نەوەی خانەوادەیە.

**زادبووم**: نیشتمان، شوێنێ لە دایک بوون.

**زادان**: هەمبانە، تۆشەبەرە.

**زادلێن** (باد.): گرارلێن. چێشت لێنەر، شیڤلێنەر.

**زادومەرگ**: مردن و ژیان.

**زادی ناوە**: واتە خۆراک و تۆشەی ژیانی نیە و هەژارە.

**زار**: دەم، دەو، دەڤ، دم. زمان، ئاخوتن، قسە. زمان: زاری کرمانجی: گۆڤاری کوردی بووە لەژێر چاودێری حسین حوزنی موکریانیدا بووە. ستان، جێ، شوێن، نیشتمان، بەلان بەتەنێ بەکار نابرێ بەڵکوو لەگەڵ ووشەیەکی تر بەکاردەبرێت: لالەزار، گوڵزار، چیمەنزار. دووبەردی شەش ڕووە، هەرڕووەی چەند خاڵێکی تێدایە یاری پێدەکرێ. زارکی کووپە، دێزە و گۆزە و مەنجەڵ و ئیتر. ـــ نانەوە: سەرداپۆشین، سەتماندن. زاراوە، واتە. بێ تین، خراو. کەساس، کەنەفت، پەریشان، بەڵەنگاز. گازاندە، گازندە. گریانێکە بە کوڵەوە تێکەڵ بەهاوار و ڕۆڕۆی بێت، ناڵە و فوغان. (ئێرە.) منداڵ، زارۆ. (ئەردە.) ژەهر.

**زارا** (یەز.): ناوی ئافرەتانە.

**زاراف** (باک.): زاراوە.

**زاراو**: ژاراو، ژەهر، ژەهراو. ئاوێکی تاڵە، کە گژ و گیا و دار و درەختان دەرێدەکەن. میز، گمێز، پێشاو.

**زاراوە**: ڕاوێژ، گوێیش.

**زارئیشە**: بڕوانە: زارێشە.

**زارە**: زراو. گەفی نیوە هاڕراو، بڕوێش، گەفەکوتاو، کژنیژە.

**زارەترەک** (جا.): تۆقیو، زراوچوو. زارە. (کە.) زاڵۆ. (ڕۆژ.) زاڵە. ـــ بوون: تۆقین لەترسان، کەسێکە لەترسان مردبێ. ـــ بردن: زراوبردن.

**زارەزار** (باک.): هاوارهاوار، دەنگی گریانێیە.

**زارەترەک کردن**: زراوبردن لە ترسان.

**زارەگا**: زارگا، بانەگا، بەرمووسڵدان.

**زارەوانە**: دەمبێن، (کۆ.) دەم بەست. چتێکە دەمی وولاخانی پێ دەبەستن لەکاتی گێرەدا تا دەغڵی نەخۆن و هەردووک لا زیان نەبینن. زاربێن. بەنێکە زارکی کووپەڵەی داپۆشراو و ئیتری پێدەبەسترێ.

**زاربەست**: جادوو، دەمبەست، زاربێن. نشتوێکە بۆ زاربەستنی نەیاران بدرێ بەکەسێکی.

**زاربەستن**: دەمبەستن.

**زاربێن**: (هەورا.) بەرەبێن. بەنی زارکی کوندە و مەشکە و ئیتر پێ بەستن. زارەوانە، دەمبەست، زاربەست. زارگووش، بزمۆک.

**زارجوو**: (هەورا.) دەمەژاو. دەمەچوو. هێندە بنێشتەیەکە بەجارێکی بجوورێ و بۆ هەمموو چتێکی تریش بەکاردەبرێ، کە بەقەد وی بێ.

**زارچاو**: قین، ڕق، ڕک، ژەهرچاو.

**زارخەن**: دەم بەپێکەنین، ڕووخۆش. زارخەنە.

**زارخەنە** (ئەردە.): پێکەنینێکە، کە بەدەم ڕق و قینەوەبێ، زەهرخەنە.

**زاردەشت**: زار: زمان، دەشت: ڕاست، ڕاستان. زمانڕاست، ڕاستبێژ، ڕاستگۆ، پێغەمبەرێکی کوردبووە.

**زاردڕاو**: دەمدڕاو، زۆربڵێ، ڕازڕانەگر. ـــ ی: دەمدڕاوی.

**زارزار** (باک.): زار زار، هاوارهاوار، دادوبێداد.

**زارزارۆک**: کەسێکە زۆر زاری و دادوهاواری بکات.

**زارک**: زاری کووپەڵە و ئیتر. زارکی کیسە و توورەکە و جەواڵ و تێر و ئیتر. زارەوانە، سەرپۆش، دەڤک.

**زارگا**: بەرمووسڵدان.

**زارگە**: زارکی چاڵاو و جۆگەی سەرداپۆشراو.

**زارماڵینەوە**: قرم لێخۆشکردن.

**زارنانەوە**: سەرنانەوە، سەرداپۆشین، سەتماندن.

**زارنەرم**: زمانلووس. ـــ ی: زمانلووسی.

**زارۆ** (باک.): مناڵ، منداڵی گچکە، بەچکەی بچووک. (هەورا.) زارڕۆڵە. زارۆک بچووکێ ویە، لەبەرئەوەی زۆر زاری و قیژە و هاوار دەکەن ناویان ناوون زارۆ.

زارۆک

**زارۆتی** (باک.): منداڵێتی.

**زارۆک** (باک.، بۆتا.): منداڵ، بچووکی زارۆ.

**زارۆڵە** (هەورا.): زارۆ. منداڵی گچکە.

**زارۆڵەدانە** (هەورا.): منداڵدان.

**زاروزێخ** (باک.): خانەدان، ڕەسەن، بەناوونیشان.

**زاروو**: زەروو. (ئەردە.) مناڵ، منداڵ.

**زارووک** (باد.): منداڵدان.

**زار هەژدیها**: دەمەهەژدیها، دەمەشێر. جوورە گوڵێکە.

**زارێشە**: دەرکولی. زارێشەیەکی پفکەی سپی هەبێ: ڕەگی هەناریێ و هی توو ترک و شواشینگی قەدقەد بکرێ لە ژوورێکیدا لە ئاوی بنرێ دوایە بکولێنرێ ئاوەکەی لە خوورێنی چەندجاران لەمزاروەردرێ و تێیدا ڕاگیرێ چاکی دەکاتەوە، دیسان بۆ زارێشە قەلیە ٤م و زەرنیق ٣م لەنێو چەند

زەردێنەیەکی هێلکەی کرێ و ئەوانیش لەنێو هەویری بگیرێ ئەوسا لەناو کڵی تەپاڵەدا تەواو بسووتێ، سووتاوەکەی هێلکەکەی بە دوو سێ دەستان زاری ئێشاو چاک دەکاتەوە. گیای پەرەسپیلکە بەکولاوی لەنێو دەم و زاری ئێشاو بگیرێ کە ووشکە ئێشی پێ چادەبێتەوە.

**زاری:** شین، شیوەن، گریان، هاوار، زارزار، گلەیی، سکالاً. کەنەفتی، کەساسی.

**زاریان** (ئەردە.): گریان، گری، گریە.

**زاری کرمانجی:** شێوەی کرمانجی، گۆڤارێکی کوردی بووە، کاتی خۆی لە رەواندزێ چاپ و پەخش دەکرا.

**زارین:** دادو هاوارکردن، ناڵە و فەریاد. گلە و گازاندەکردن.

**زاز:** زازا.

**زازا:** ئەوە، بەچکەی بەچکە، کوڕی کوڕ، کچی کچ. چەند ئێلێکی کوردە، کەوتوونەتە لای ڕۆژاوای کوردستانێ، لەپێشدا ناوی وان (دومل ــ دونبل) بووە، بەڵان لەرووی ئەوەوە، کە لەزاراوەی دونبلاندا تیپی (ز) زۆر بەکاردەبرێ، ناویان لەو دوایەیدا بووبە زاز، زازا لەپێشدا لە باکووری کوردستانی ژێردەستی ئێران و ترکاندا بوون بەڵان ئەمڕۆ لە ڕۆژاوای شاری (ئامەد ــ دیاربەکر)ێ دادەنیشن ناوی پایەتەختی وان باڵۆ، باڵەو، پەهلەوە لەو ڕووەوە دروستە، کە بێژرێت لە بنچینەدا پاڵەوی پەهلەوین.

**زازکی:** زاراوەی زازایان.

**زازیی:** شێوەی ئاخەفتنی زازایان. جوورە هەڵپەڕینێکە.

**زاغ** (زا.): گێژ، خەت، دێڕ.

**زاغۆر** (زا.): زاخڕ.

**زاغووری:** شەدەی سەر.

**زاف** (کە.): لەبرسان دڵێشە. ــ کردن: لە برسان دڵ ئێشان.

**زاڤ** (باد.): ئایین، ڕاڕەو.

**زاڤا** (باک.): زاوا.

**زاڤل** (باک.): گیایەکە.

**زاق:** ڕەوشەن، روون (بۆ ڕەنگ). (کە.) زەق، داپچڕاو. ــ کردن: داپچڕاندنی چاو بۆ ترساندن. (ئەردە.) ڕەنگی کاڵ. چاو بە مۆڵەق ڕاوەستاو. واق، سەرسام، بەیەکێکی دەڵێن، کە چاوی زەق بێ و لەبەر سەرسامی هیچ نەبینێ. چاوی زەق، کە نەیقووچێنێ.

**زاق و زووق:** دەنگەدەنگی منداڵان، زیقەزیقی منداڵان، زاق و ویق.

**زاق و زیق** (کە.): زاق و زووق، زاک و زووکی منداڵ.

**زاک** (باک.): باڵندەیێکە. گرێ(پێوانەیەکە بۆ پێوان). (وان.) ژەک (ژەکی مێیینەی تازە زاو).

**زاکە:** زیقە.

**زاکەزاک:** زیقەزیق.

**زاک و زووک:** زاق و زووق، زاق و زیق، نووزەنووزی منداڵ. نووسکە نووسکی سەگ.

**زاک و زیک:** زاق و زیق.

**زاک و ماک** (هەو.): بەرخ و مەڕ.

**زاگ:** زا، برازا، خوشکەزا، ئامۆزا. منداڵ (کوڕ ــ کچ). (ئەردە.) زاو، زا.

**زاگا:** تیرەییێکی کوردە لە هۆزی کەبابی لە قەراخ هەولێرێیە.

**زاگان** (ئەردە.) زاگەل، سێ گەوهەر.

**زاگە:** زاوە، زایگە.

**زاگەل** (ئەردە.): زاگان.

**زاگرۆس:** نێوی چیایەکیە.

**زال** (زا.): هەزار.

**زاڵ:** پیر، گێتی دیتوو، لەناوساڵانەوە چوو. زۆردار، زەبەردەست، قاندڕ، چیرە، خورت، زۆربا، دەستەڵاتدار، بەمل. ــ بوون: چیرەبوون. ــ کردن. بەسەروا ــ بوون: دەستەڵات بەسەرداپەیدا کردن، پشت شکاندن. بابی ڕۆستەمی پاڵەوان بووە.

**زاڵە** (ئەردە.، کە.): زراو(هی ئاوزگ). زاورە. زارە، زاوەر، زەنەق، زەندەق. (کە.، هەورا.) دادوهاوار، گلەیی، هەموو کەس زاڵەی دی.

**زاڵەبەر:** دادوهاوارکار، گازندەکار.

**زاڵەبردن:** دادوهاوارکردن، گازاندەکردن.

**زاڵەتەقێن** (کە.): زاڵە ترەکبوون، زراوچوون.

**زاڵەتەقین:** زراوچوون.

**زاڵبوون:** چیرەبوون، زۆر سەندنی گیاندارێک بەسەر گیاندارێکی تردا.

**زاڵم** (ئەردە.): زرنگ.

**زاڵۆ** (کە.): زراو، وورە.

**زاڵوو** (ئەردە.، کە.، فە.): زەروو، زاروو. (کە.) زراوی ئاوزگی گیانلەبەران.

**زاڵی:** دەستەڵاتداری، زۆرداری، زاڵبوون.

**زاڵیزەڕ:** ناوی زاڵی بابی ڕۆستەمییە.

**زام** (هەورا.، کە.، زەن.): برین، زەخم. کولک. (باد.) تیژ زام: چەور. چەوری، ڕۆن.

**زاما** (فە.، ڕۆژ.): زاوا.

**زامار** (ڕۆژ.، هەورا.): بریندار، زامدار، کووڤاندار، زەخمدار. ــ ی: برینداری.

**زامەت** (ئەردە.): دەرد، ڕەنج، ئازار، شێواوی، سەودا. (زەن.) کێم، زووخاوی برینان. (ئەردە.) سەوداسەری، گراوی.

**زامدار:** بریندار، زەخمدار، زامار. نێوی نێرینانە. ــ ی: برینداری.

**زان:** (هەورا.) زای. تۆڵدانان، بەچە هاووردن، زایین، بێچووبوونی گیاندار. باردانانی هەموو گیان لەبەرێکی مێیینە بەتایبەتی ئەوانەی، کە زگ و زای دەکەن. لەسەر ــ: لەسەر دەستان، دەڵ، دەڵەدەڵ. ناوی دارێکی پتەوو قایمە. ئامرازی (بکەر) ییە. زانا، شارەزا. بەڵان بەتەنهایی بەکارنابرێت وەکوو ڕێزان، پێزان، وانەزان، نەزان، لێزان، فرەزان. مرازی بکەرە.

**زانا:** زان، زۆرزان، ماموۆتک، لێزان، شارەزا، ئاشنا، مەحلان، هیر، زانەر، خووێندەواری زۆر. نێوی نێرینانە.

**زانانن:** زانین.

**زاناهی** (باک.): زانایی.

**زانای** (هەورا.): زانی، زانین. نە ـــ: نەزانین.

**زانایی**: زاناهی، شارەزایی، ئاشنایی، ئاخووەوەندی، خوێندەواری. پەی پێ بردن، هەڵهاووردن، هەڵهێنان.

**زانەخرۆ** (جا.): زیاندەر، سەگ یا گیانلەبەرێکە لەناو ماڵدا فێری چت خواردن بووبێ بە دزی. فێڵباز، خەڵەتێنەر، زیانەخرۆ.

**زانەر**: زانا، مامۆستا. ـــ ی: زانایی، مامۆستایی.

**زانەوێر**: نێوی نێرینانە. وەجوەجە، ئاڵووگۆڕ. بات، جیات.

**زانراو**: (هەو.) ناسراو، زەمراو.

**زانست**: زانای شارەزا، زانین وشارەزایی. ئازاد بە ـــ ە: شارەزا و زانایە. زانایی، زاناهی. زانیاری، شارەزایی.

**زانستگا**: زانستگە.

**زانستگە**: زانکۆ، شوێنێکە خوێندکاران دووای قوتابخانەی ئامادەیی تێیدا دەخوێنن.

**زانستی**: زانیاری.

**زانن** (فە.): زانین.

**زانوو**: زەنگوڵ، گوێنج یا لوولەی ئانیشکەدار.

**زانی** (شوا.): چۆک، ئەژنۆ.

**زانیار**: زان، زانا، شارەزا، سەیدا، مامۆستا. ـــ ی: زانین، زانست، شارەزایی. زانستی.

**زانین**: زانن، شارەزایی، لێزانین، سەرلێدەرچوون، سەرلێدەرکردن، تێگەیشتن، پەی پێبردن، هەڵهاووردن. پێ ـــ: لەچاودابوون، ئەمەگداری. پێ بە ـــ دان: پێزاناندن. لێ ـــ: سەرلێدەرچوون.

**زاو**: زای. گیاندارێکی مێیینەیە، کەتازە بەچکەی بووبێ دیسارە ئەم مەبەسە تەنها ئادەمیزاد و وڵس (حیوان) دەگرێتەوە چونکوو پەلەوور نازێ هێلکەی دەکاو لەسەری کورک دەبێ، هەر بەوجۆرە، کیسەڵ، ماسی، قرژاڵ بێچوو هەڵناهێنن بەڵکوو هەندێکیان هێلکەی دەکەن وەکوو پەلەوەرین و هەندێکیشیان گەرایان هەیە وەکوو کوللە و ماسی و ئیتر. لەبەشی باڵنداندا تەنها شەمشەمەکوێرە زا و زێ دەکات وشیریش بە بێچووی خۆی دەدا هەر لەبەر ئەوەشە ئەو ڕازە کراوەتە مەتەڵ: ئەگەر هۆشت هەیە و هۆشت لەبیرە لەناو مەلاندا کامیان بەشیرە؟.

**زاوا**: زەما، زاما، زاڤا، یەزنە. ئەو نێرینەیە، کە ژنی بۆ داخووازی کرابێ دووای گوێزتنەوەش تا مانگێکی هەر زاوای پێدەڵێن. نازناوە بۆ مێردی خوشک و کچ و ئافرەتانی نزیک.

**زاوبەندی**: ڕێک کەوتنێکە لە نێوانی زاوا و خەزووراندا بەو مەرجە، کە زاوا هەر لەماڵی خەسوو و خەزوورانیدا بمێنێتەوە.

**زاوایی**: زاوایەتی.

**زاوە**: نزیکترین ئەستێرەیە لە ڕۆژێ. تیر، ئەستێرەی زانست. سیوەیل(عتارد).

**زاوەرە** (ئەردە.): زاوور.

**زاوزۆ**: زاوزێ. (خۆ.) زاوەزۆ. (هەورا.) زەهە. (ڕەوا.) زەوەزە. (هەورا.) زەهە. زەو، بەسەرەتا و کانگای زانی ئاژاڵ و ماڵاتانیش هەر ـــ دەڵێن.

**زاوزوو**: زگ کردن و منداڵبوون.

**زاوزووە**: زاوزێ، بەچکە، بێچوو.

**زاووزێ**: زگ کردنی مێیینەیەکە یەک لەدووای یەکتری.

**زاوڵە** (هەورا.): منداڵ.

**زاوڵەدان** (هەورا.): منداڵدان.

**زاوما**: تێکەڵکردنی کاروبەرخانی ساوایە لە گەڵ دایکیان لە بەیانیەوە تا ئێوارە. ئیمرۆ مەڕ و بەرخ ـــ یە.

**زاوور**: زارە، زاڵە، زاوەرە. زراو، کیسەیێکە ئاوێکی تاڵی تێدایە بەقەد سی و جەرگەوە. زات، توانا، ئەترەش، یارا. ئازاد بە زاوورە: بەزاتە.

**زاوورچوون**: زراوچوون.

**زاوزووە** (ئەردە.): بێچوو، بەچکە.

**زاووزێ**: زاوزۆ.

**زاویە**: گۆنیا، سێسووچ.

زای (هەورا.): زان. زاخ.

**زایاندن**: مامان ژنە دووگیانەکەی زایاند واتە منداڵەکەی پێدانا.

**زایە**: پس، زا. گوڵندام ـــ ی لەمزگیدایە.

**زایەبوون**: مەبەس لەمردنە.

**زایەڵە**: زریکە و هاوار و ئاوازی مۆزیقەی بەرزە. (هەورا.، زەن.) هاوار و داد و ڕۆڕۆ، گریان و زاری. زایڵە.

**زایەبەند** (باک.): ئەشکەوت، غار.

**زایڵە** (کە.): زایەڵە، زریک و هۆڕ، شیوەن، زاری.

**زاییچە**: دەنگ و باسی لە دایک بوونی منداڵ، مزگێنی زانی ئافرەتێک.

**زاییکە**: شوێنێکی تایبەتە، کە منداڵی تێدا لەدایک دەبێ.

**زاییگە** (ئەردە.): زاوە، زاگە.

**زایین**: زان، زانی گیاندار، زانی گیانداری مێ یینگە، زانین، پەیدابوون، بوون، منداڵ و بەچکەبوون.

**زەب** (زا.): چتی زۆر ڕەق.

**زەباندن** (باک.): فریودان، لە ڕێ دەربردن، ئازارکردن، بزەبینە.

**زەبەر** (باک.): کاوول، وێران. ـــ کرن: کاوولکردن، وێرانکردن. (زا.) ژێر.

**زەبەرجەد**: (باک.) بەرزەڕین، زوبەرجەد، زومرووتی زەرد.

**زەبەردەس**: زەبەردەست.

**زەبەردەست**: دەسترۆیشتوو، زاڵ. زەبەردەس، زەبر بەدەست. زۆردار، توان. ـــ ی: زاڵی، زۆرداری.

**زەبەردەسی**: زەبەردەستی.

**زەبەش** (زا.): شووتی، (باک.) شەبەش. شفتی.

**زەبەلاح**: فیلەتەن، زەلام، لەندەهۆر، قۆڵماتی، چوارپەلقەوی.

**زەبەن**: زەبەنگ، زەبەند.

**زەبەند**: زۆر، گەلێک، فرە، زەوەند. (باک.) زەعەف. بۆ زەوییێکیش بەکاردەبرێ، کە پڕ لە گژ و گیا و دەغڵ یا قامیش و درک و داڵ.

**زەبەندەی**: زەمەندایی.

**زەبەنگ:** زەوەند.

**زەبر:** زۆر، هێز، تین، (باک.) برە. تەووژمی کوتان و لێدان. ــ ی مەدەیە.

**زەبرەبەند** (خۆ.): قوزەڵقورت، دەردێکی بێ ئامانە تەنها لە کاتی خواردن و خواردنەوە بەکار دەبرێ دەڵێن بە ــ بێ: بە قوزەڵقورت بێ.

**زەبرەقوتە:** زەبرەقوون، هێلکە، خا.

**زەبرەقوون:** هێلکە.

**زەبرەقوونە** (ئاک.): هێلکە.

زەبرەقوون

**زەبرەدەست:** زەبردار، مرۆی زۆردار و دەستدرێژ، دەسدرێژ. ــ ی: زەبرداری.

**زەبردار:** هێزدار، دەستەلاتدار، بەتین، زەبرەدەست. ــ ی: زۆرداری.

**زەبرگەیاندن:** نهێم گەیاندن بە چتێک.

**زەبروزەنگ:** دەستەلات، زۆرداری، سام، ساف، توندوتیژی لە کاروباردا. ــ ی: دەستەلاتداری.

**زەبرووونی** (هەورا.): تەووژمی خوێن.

**زەبلەک** (باک.): ڕیخۆڵەی ئەستوور. ــ داگرتی: ڕیخۆڵەی پڕ.

**زەبلەک ئەستوور** (خۆ.): کەسێکە دەست و پێی ئەستوور و خۆشی تەپ و تەنبەڵ بێ.

**زەبلۆق:** چتی لووس.

**زەبنینی** (باک.): لێدران، کوتران، ئازاردران، فریودران.

**زەبۆر** (باک.): باڵندەییێکە.

**زەبوون:** بێ هێز، ناتووان. ترسەنۆک، لەڕ، بێتین، زار. (هەورا.) ترسەزاڵ. کەنەفت. گیانداری لاوازی بێ هێز. ــ بوون: بێ هێز و کەنەفت بوون. ــ کردن: بێ هێز و کەنەفت کردن.

**زەبوونی:** بێ هێزی، کزی، ناتووانی، بێ زۆری.

**زەبەلاح:** فیلەتەن، زڕ، زڕتەبۆز. زەبەللاح، حۆیە، ناقۆڵا، لەندەهۆر، زەها، زها. بۆ گیانلەبەری زل و قەڵەو بەکاردەبرێ.

**زەحەڤ** (باک.): زۆر، فرە، گەلێ.

**زەحف** (زا.): زۆر لە هەموو چتێک. (ئەردە.) بێهۆش، لەسەرخۆچوون، لەخۆچوون.

**زەحفەران:** زەعفەران.

**زەحفەرانکردن:** ڕەنگی چتێکی کردنە ڕەنگی زەعفەرانی.

**زەحفەرانی:** چتێکە ڕەنگی وەکوو ڕەنگی زەحفەرانی وابێ.

**زەحفکرن:** دڵچوون.

**زەحلە** (فە.): زراو، زەردەکی، تەڵەکی.

**زەحیری:** زگچوون بە خوێنەوە، خوێن دانیشتن.

**زەخەرە** (بل.): هەر سەگێکی بەرازێکی بکووژێ کەمێکی لە پێستی بەرازەکەی دەکەنەوە و کونی دەکەن و لە ملی سەگەکەی دەکەن بەو پارچە پێستە دەڵێن ــ. (ئەردە.) ڕووی کەوا و سیخمە و قاپووت و چتی وایە بەو مەرجە، کە پێست بێ.

**زەخەڵ:** ناڕاست، دەخەڵ، تەمبەڵ. قومارباز.

**زەخت** (زا.): نەقیزە.

**زەختە** (دەر.، پیرە.، کە.): نەقیزە. سەختی.

**زەخم** (هەورا.): برین، زام، کولک.

**زەخماوی:** بریندار.

**زەخمە** (باد.): سیخمە. (هەو.، کە.) ئەو قایشەیە ڕکێفی تێهەڵدەکێشرێ بەزینەوەیە. (موک.) لووغمە.

**زەخمەپێچ** (هەورا.): برین پێچ.

**زەخمبەس** (هەورا.): برین پێچ.

**زەخمدار** (هەورا.): بریندار، زامدار، زامار، کەلەل. ــ ی (هەورا.): برینداری، زامداری، کەلەلی.

**زەخمەدەرکردن:** سەرهەڵدانی برین لە لەش.

**زەخمەک:** قایشێکە بە زینەوە ئاوزەنگی تێدەخرێ.

**زەخمکردن:** زەخمدارکردن، بریندارکردن.

**زەدە:** زادە، گیوزادە، داماوزادە. شکست، زیان بەسەرهاتوو. چتی شکست.

**زەدەدار:** هاجری.

**زەدوخورد:** لێکدانی دوو یا چەند کەس.

**زەر** (باک.): زەرد.

**زەڕ:** ووشەیەکە بۆ هاندانی زەڕاندنی کەر و ئێستران بەکاردەبرێت. (هەورا.) زێڕ، پوول، پارە، دراو. تەلا.

**زەرا:** چتی زۆرکەم.

**زەرات:** گەنمەشامی، زورات.

زەرات

**زەراڤ** (باک.): خوێنڕێژ، بکوژ، کوژەر.

**زەرفە** (زا.): کونی چکۆڵەی دیوار.

**زەڕاندن:** زەڕینی کەر و ئێسترانە. (کە.) شەهاندن، ئەڕەئەڕ. سەڕە، زووڕەزووڕ.

**زەرانی** (کف.): چۆک، ئەژنۆ.

**زەراهی** (باک.): زەردایی، زەرایی، زەردی.

**زەرایی** (باک.): (باک.) زەراهی. زەردایی.

**زەرە** (باک.): ڕەنگزەرد. زەردوویی، زەرتکی ماڵاتان.

**زەڕە** (هەورا.): چارە، ڕەزا. ــ تاڵ: ڕەزا تاڵ. (موک.) زەڕەی کەر و ئێسترانە، سۆڕە. زڕە، زووڕەزووڕ، سەڕە. ئەڕە. دەنگی زەڕینی کەر و ئێسترە.

**زەڕڕە:** ئێسک. ــ ی تاڵە: ئێسکی قورسە.

**زەڕەتوشترە** (ئاوێ.): زەڕدەشت.

**زەڕەتاڵ:** ئێسک قورس.

**زەڕەزەڕ:** زووڕەزووڕ، ئەڕەئەڕ. زەڕەی یەک لەدووای یەکترییە.

**زەڕەشیرین:** ئێسک سووک.

**زەرەک:** ملوانکەی زەردوویی کارەبا. (باک.) زەردوویی، نەخۆشی زەرتک.

**زەرەکەت:** وێنجە، شەوەر، گیایەکی دەستچێنە دەکرێتە گزرە، کە ئاژاڵان بە تەڕی و ووشکی دەیخۆن.

**زەڕەكەو** (زا.): زڕەكەو.

**زەرەكی** (باک.): زەردایی.

**زەرەند** (هەو.، بابا.) زەرەنک. كاڵەكە مارانە، گونەسە، گووی بەلە، گووژاڵک. گیایەكە بەرێكی دەدات دروایە وەكوو هێلكەی لێدیّ پێی دەڵێن گونەسە چونكوو وەوی دەچێ تۆوێكی ڕەشی زۆری تێدایە، كۆلكێكی لەنێو گەز درێژتری هەیە، كە بەقەد داردەستێكی ئەستوورە وشک دەكرێ و دەكوترێ و بە ووردی بەسەر برینی كرماوی هەر ماڵاتێكی وەركرێ چاكی دەكاتەوە. لەسەر كۆلكەكەی زۆر چڵان دەردەكات هەر چڵەی بستێک بڵندە لەنێو قەدی چڵەكاندا گوڵێكی بۆر دەردەكا وەكوو گونە پشیلەیە تۆوەكەی بۆ بدرێ و بە ووردی بەشەكرەوە لە خورێنی بخورێ بۆ هێزی چیكڵدانە باشە بەرەكەی بەشاف هەڵگیرێ بۆ مایەسیری بەسوودە. گەڵایەكەشی بە وشكی و ووردكراوی تێكەڵ بە خورما بكرێ چەند حەبێكی بەقەد دەنكە نیسكێكی لێ دروستكرێ بەو مەرجەی، كە هەر شیری بخوا و سبەینەیەكی (٥) حەبی لێ بخوا دوایەش چەند ئیستكانێک ئاوی گەرمی لەسەر بخواتەوەو ئاوی سارد نەخوا بۆ سەفراو زەردوویی و بێوەسیری زۆر باشە.

**زەرەنگ**: زەرەند، گیایەكی بەهاریی گەڵاپانە دووبەران دەگرێ یەكەمینیان وەكوو گوێچكە و ئەویتریان وەكوو شەمامەیە بۆ كوژتنی كرم بە برینی چوارپێیانداەكرێت.

**زەڕەنگەر**: زێڕینگەر، كەسێكە زێڕكاری بكات. ـــ ی: زەڕكاری، زێڕكاری كردن.

**زەڕەوشان**: شاباش، شاواش.

**زەڕەهاتن**: مەبەس لەسەركێشی كەسێكی وایە، كە بەرزتر لەخۆی بدوێ و باخووێ.

**زەرب** (باک.): چالاكی.

**زەربی**: جووره داره بییەكە.

**زەریاف**: زێڕبافت، زەڕی، كری بەسیم. ڕازاوەوە، كری سیمدار.

**زەڕیەش** (باد.): زەبەش.

**زەریانن** (ئەردە.): لێدان، كوتان.

**زەریچی** (زا.): مرۆی زەردەڵە و لاواز.

**زەرییان** (ئەردە.): لێدران، كوتیان، لێدریان.

**زەرتک**: (هەو.، ڕەوا.) زەردوویی، ئازارێكە تووشی گیانلەبەران دێت سپێنەی چاوی و پێستی لەشی زەرد هەڵدەگەڕێ. (باد.) جووره ترێیەكە. (خۆ.) گرتەک. بازەڵە، كولكێكە لە منداڵی ساوا دێت تا تەمەنی سێ مانگی، كە دەرنەبێ دەیكوژێ. پێستی مریشكی ڕەش دەیڕەوێنێتەوە. مووروی كارەبا و بە مووروی زەردیش دەڵێن، بە دەستەوانەیەكیش دەڵێن، كە لە مووروی كارەبا دروستكرابێ. (باک.) زەردێنەی هێلكە. گیایەكی بەهارییە بەتەڕی ڕەشە، كە وشک بوو زەرد دەبێ و خوری و بەنی پێ ڕەنگ دەكرێ بە زەردێكی جوان.

**زەرتكە**: جووره گەنمێكی زەردی دەنک قەڵەوە.

**زەرتووتک** (باک.): زەردی كا.

**زەتک**: گەڵایەكی بچووكە وەكوو وەج لەبن گەڵای تووتندا زەرددەبێ.

**زەرتوشت**: پەروەردكار، نەژاد پەروەر، ترووم پەروەر.

**زەرچی** (باک.): هەوەڵ سەوزایی بەهارانە.

**زەڕخەسوو** (ئەردە.): زڕخەسوو.

**زەڕخڕی**: زێڕكڕی، زەڕخڕید.

**زەڕخڕید**: زەڕخڕیدە، بەندە، كەنیزەک.

**زەرخڕیدە**: زەڕخڕی، زێڕكڕی، زەڕخڕید. بەندەیەكە بە پوول كڕابێ.

**زەرد**: ڕەنگێكە وەزەردێنەی هێلكەی دەچێ. زەڕ، ڕەنگێكە هەتاوزەردە. گەڵای دارانیش، كە وشكبوون زەرد هەڵدەگەڕێن. ـــ ی ڕەنگی پرتەقاڵی: حوول، حوویل. (موک.) كێوی چڕ و سەخت. كێوێكیشە لە موكریان. تاش، كەمەر. (كە.) ماه و شاخێكی سەخت و داتاشراوە وەكوو گەلی عەلی بەگ. شووێنی سەختە لە چیایاندا، ماه. (بابا.) جووره ترێیەكە. مسی زەرد كانێكە سەماوەر و هەندێ ئامرازی تری پێ دروست دەكرێ.

**زەڕداڵ**: سەندەڵ (گیایەكە).

**زەڕداڵوو**: زەردەلوو، قەیسی.

**زەرداو**: زووخاو، كێماو، ئاوێكی زەردە لە برینان دێتەدەرێ. (باک.) تەوول. سەفرا، ئاوێكی تاڵ و زەردە لە دەروونی هەندێ كەسەوە دێتە دەرێ پێی دەڵێن سەفرا.

**زەردای** (هەورا.): زرینچک.

**زەردایی**: زەراهی، زەرایی، زەركی، زەردێتی. زەردێنەی هێلكە.

**زەردایی كردن**: بە ئاستەم تروسكەكردنی چاو.

**زەردە**: نەرمە پێكەنین، گرژینەوە، بزە، زەردەخەنە، زەردەكەنی، لێو خەند، (باد.) دەڤكەنی. زەردەلێو، لچ خەنە. ـــ ی هەتاو: زەردەخۆر، زەردەپەڕ، گزنگ، گەزەنگ، تیشكێكی بێ تینی خۆرە بەسەر چیا و جێگایانی بڵندەوە. ـــ كەوتووە. ـــ ماوە. جووره ماسییەكە وەک قاشتە بەڵام پوولەكەكانی ڕەق و زل نین و لە خواردنا فڕێ نادرێ. جووره ترێیەكە. (زا.، باک.) زەردەلە. هەڵوای شەكری، كە لەشیر و برنج و چتی شیرین دروست دەكرێ. (باک.) نێوی ئافرەتانە.

**زەردەبی**: جووره دارەبییەكە لە چوارجوورەكان، (باک.) بی زەر.

**زەردەپەڕ**: زەردە، زەردەلپەڕ. زەردەی ئێواران. كاتی ئاوابوونی خۆر كە زەردە بەسەر كەلەوەبێ.

**زەردەپێهاتن**: پێخۆشبوون. بە سووكی تەماشاكردن، گەمەپێكردن.

**زەردەجۆش**: خەركان، خەركانە.

**زەردەچەوە**: زەردەچێوە.

**زەردەچۆ** (ئەردە.، هەورا.): زەردەچێوە، زەردەچوو.

**زەردەچوو** (هەو.): زەردەچێوە.

**زەردەچێوە**: (هەورا.) زەردەچۆ. (هەو.) زەردەچوو. دەرمانێكی زەردە بە ووردكراوی بەسەر چێشتی شلەدا دەكرێ.

**زەردەخەنە** (هەورا.): زەردە، (باد.) دەڤكەنی. نەرمە پێكەنین، گرژینەوە، بزە، زەردەكەنی، زەردەلێو، پێكەنینی بێ دەنگ، دزەخەنە، لچ خەنە.

**زەردەدڕک**: دڕكەزەرد.

**زەردەزیڕە**: (بابا.) باڵندەیەكی بچووكی سەر ڕەشە لە هەڵفڕینێدا دەزیڕێنی گەرمێن و كوێستانی دەكا. (موک.) باڵندەیەكی چكۆڵەی

زەرد و سپییە. زەردۆرە، زەردۆڵە. (بابا.) زەرگەتە. جوورێکە لە زەردەواڵە و زەردە و بچووکترە لە زەردەواڵە. (بابا.) زەردەواڵە.

**زەردەسیری**: گیایەکی گەڵا ووردی دڕکاوییە بۆ کەچەڵی زۆر باشە.

**زەردەشامی** (خۆ.): باڵندەیەکە بەقەد هەوێردەیە دەنگی زۆر خۆشە. گۆرەوی چنە، گۆریەچنە، بە سێ جوور دەخوێنێ سەرباڵەکانی ڕەشە ئەوانی تری زەردە لەنێو دارستانی پڕ ئاو و چۆڵان دەژی.

**زەردەشت**: (هەورا.) زەرتوشتر. پەروەردگار، ترووم پەروەر، نەژادپەروەر، زەرتوشت، زراتەشت. زەرادهشت، زەردهیشت. پێغەمبەرێکی کورد و لە مادەکان بووە نزیکەی حەوت سەدە لەپێش عیسادا لە کوردستانێدا سەری هەڵداوە و زادگەی وی شاری سەردەشتە و ڕووی لەگەل کرد، کە ڕوو لەپەرستنی خودای تاک و تەنیا بکەن. ناوی باوی: (پوورشسپ) و ناوی دایکی (دوغدۆ) بووە. بەویان (زەرتەشت ئسپیتمان) هەم کوتووە، لە داستاناندا مێژووی ژیانی وی بە (٦٠٠) ساڵ پێش عیسا نیشاندەدەن بەلاّن مێژوونووسانی ڕاستەقینە لەوبڕوایەدان، کە زەردەشت لەسەردەی حەوتەمی پێش عیسا واتە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی مادانداو لەپێش دەستەڵاتی هەخامەنشیاندابووە و ئایینی زەردەشتی لە سەردەمی هەخامەنشیان و لەسەردەمی ساسانیەکان لە کوردستانێدا ئایینێکی ڕەسمی بووە و نامەی ئاسمانی وی ئاوێستایە.

**زەردەشتی**: مەزدەسنی.

**زەردەکەنی**: زەردە، زەردەخەنە.

**زەردەکی** (فە.): زراو.

**زەردەگەر**: نەرمەپێکەنین، زەردەخەنیکار.

**زەردەگووێنی**: گیایەکی دڕاوییە، کەتیرەی زەردی نەباتی لێ پەیدادەبێ.

**زەردەلە**: میوەیەکە لەبەر هەتاو ووشک کرابێتەوە.

**زەردەڵە**: مرۆی زەرد و لەڕ و لاواز، ڕەقۆڵە.

**زەردەلیەر** (باک.): زەردەی ئێواران. زەردەپەڕ.

**زەردەلۆ** (هەو.): گیایەکی زەردە.

**زەردەلوو** (هەو.): قەیسی تەڕ و تازە. شیلانە، زەردەلووێ. زەردالوو. (باد.) هەڵووژە زەردە. (لو.) قەیسی.

**زەردەلووێ** (لو.، هەورا.): قەیسی ووشک و تەڕ.

**زەردەلێو**: زەردەخەنە. ــ ی: باری زەردەخەنەی.

**زەردەمار**: جوورە مارێکی زەردی ڕەقی پیسی کوژندەیە.

**زەردەماسی**: ماسییە زەردە.

**زەردەنێو هێلەی** (هەورا.): زەردێنەی هێلکە.

**زەردەواڵە**: زەرگەتە، زەردەواڵە. (بابا، هەورا.) سیرەمۆزە، گیاندارێکە ڕەنگ زەردە باڵدار و چزووداره لە هەنگ و مێش زۆر گەورەترە و هەندێکیان کوژندەن.

**زەردەوەلی**: گۆرەوی چنە، باڵندەیەکە لە کۆتری گچکەترە. زەردەوێڵە، باڵندەیێکی زەردی جوانی باڵ ڕەشە.

**زەردەوێڵە**: گۆرەوی چنە. باڵندەیەکی زەردە هێندەی خەزاییکی دەبێ. (شا.) زەردەشامی. (گەرد.، باک.) زەردەوێلە.

**زەردەهاتن**: گرژینەوە.

**زەردەی** (هەورا.): زەردوویی دەستی ژنان.

**زەردەیی**: زەردی. (ئەردە.، زەن.) زەردوویی کارەبایی دەستی ژنان و ئیتر.

**زەردباو**: زەردباوە.

**زەردباوە** (جا.): زەردنووێن، مەیلەو زەرد، ڕەنگێکە بە زەردی بڕوانی.

**زەردبوون**: ڕەنگپەڕین. زەردهەڵگەڕان، ترسان. ووشک و ڕەقبوونی گەنم و جۆ، کاتی دروێنە. گەییشتنی برین و قوونێر.

**زەردسیری**: جوورە گیایەکە دڕووی تێجگار زۆر ووردە.

**زەردکە** (بابا.): جوورە ترێیەکە.

**زەردکەوێت**: ڕەنگی سوورێکە بە زەرد بڕوانێ (بۆ وولاّخی بەرزەیە).

**زەردکردن**: نیوەکوڵاندنی هەندێ سەوزی بامێ یا کەنگرە، کە زەردکراوە. زۆر ترسان و زەردهەڵگەڕان.

**زەردکریاگ**: زەردکراو، نیمپەز، نیم پوخت، ناوپەز.

**زەردکی** (فە.): زەرتک.

**زەردنەیەی هێڵەی** (هەورا.): زەردێنەی هێلکە.

**زەردۆرە**: باڵندەیەکی زەرد و سپییە. (کۆ.) زەردەزیرە.

**زەردۆڵە** (ڕەوا.): باڵندەیەکە. (دزە.) زەرگەتە.

**زەردۆیی** (هەورا.): زەردوویی. ناوی تیرەیەکی کوردە لە ڕۆژهەلاتی سیروان.

**زەردوزۆڵ**: چتی زەرد و جووان.

**زەردووزی**: بەسیم چنین.

**زەردوسوور** (زەن.): کۆلکەزێڕینە. گوڵ و بەرگی ڕەنگاوڕەنگ. منداڵ: گیو کۆشێک ــ ی لەپاش بەجێ دەمێنێ.

**زەردووم** (باک.): داری شەرپییە، گۆپاڵ، داردەستی شەڕێ. نەخۆشییەکە تووشی مرۆ و مەرەزە بێ زەردیان هەڵدەگێڕێ.

**زەردوویی**: زەرتک، (هەورا.) زەردەی. ڕاوەندی چینی دە مسقال، شەکر (٥)م. بە ووردی لەنێو ئاوی شووتی یا شەکراوێدا سبەینە و ئێوارە بخورێتەوە پڕ کەڵکە. موورووی زەردی کارەبایی. (دەر.) کارەبا، زەردی. (زەن.) زەردەیی. ژنان بەرموورو و دەستەوانەی لێ دەهۆننەوە لەمل و دەستیانی دەکەن.

**زەردێ** (بابا.): جوورە ترێیەکە. نێوی ئافرەتانە.

**زەردێنە**: ــ ی هێلکەی: (باد.) زەرکا هێکی. زەرتک. ئەو بەشە زەردەیە، کە لەناو هێلکەیدایە.

**زەردێنۆ هێڵەی** (هەورا.): زەردێنەی هێلکەی.

**زەردی** (زەر.): زەردوویی، زەرەک. (باک.) بەزەک. ڕەنگی زەرد، زەردێتی، زەری.

**زەردی شامی** (کۆ.): باڵندەیەکە.

**زەردینە**: خشڵ، چەکی ژنان.

**زەردیوەلی** (هەورا.): باڵندەیەکی زەردی بچووک و جۆ خۆرە لە پاساری گچکەترە و باڵی ڕەشە.

**زەردیوی**: زەردوویی.

**زەرزا**: ناوی هۆزێکی لە ناوچەی هەولێر.

**زەرزانیق:** دارێکی درێژە نیوەڕاستەکەی لەسەر جێگایەکی بەرز دادەنرێ دوومنداڵ سوواری ئەم سەرەوسەری دەبن هەردەمەی یەکێکیان بەرزدەبێتەوە. هەڵلادۆشە.

**زەرزەڤات** (باک.): سەوزەوات، سەبزەوات، سەبزی، پنجار.

**زەرزەنگ:** پسپسۆک، تەسبیح. ڕستەی میوەی ووشک.

**زەرزوور** (باک.): پەرەسێرکە، پەرەسلێرکە.

**زەرسک:** جوورە دارێکە تێکوڵەکەی دەکرێ بە دەرمانی چاو.

**زەرسۆر** (باک.): سوورێکە بە زەردی بروانێ.

**زەرف** (ع.): پاکەت، کە نووسراوی تێدا بۆ شوێنانی دوور و نزیک ڕەوانە دەکرێ. چیکڵدانە، پشوو درێژ. ئازاد لەکاروباراندا ،بەـــە یا بێـــ.

**زەرڤارا:** پارەگۆڕەوە.

**زەرقی:** کەل و پەلی جوانی ڕەنگین.

**زەرک** (باک.): تاسی ئاوێیە. (بۆتا.) گادۆشە، بێردۆش. سەتڵ، پەقرەچ، تاس، تاسە، کاخک، کاسک لە خاکێ دروستدەکرا. زەرگ. تێکولی گوێزی تەڕە، کەمکۆڵ. (باد.) جوورە ترێیەکە. (زا.) زەردێنەی هێلکە. (باک.) زەرتک.

**زەرکاهێکی** (شەم.، باد.): زەردێنەی هێلکەی.

**زەرکەتاڤ** (زا.): زەردەی ئێواران.

**زەرکەزەوی:** گیایەکی بندار و شیرینە پەلکی وەهی کەرەوزێ دەچێ، پاک دەکرێ، بەرزنابێ و بەسەر زەویدا ڕادەکشێ و پەخش دەبێ، سەلکەکەی بەپاککراوی شیرینە و دەخورێ.

**زەرکەش:** جوانکردنی دیوی دەرەوەی چتان بە زێڕ، ئاوەزێڕ، ڕووکیشی زێڕی.

**زەرکەشی:** ئاوەزێڕکاری چتانە بە زێڕ.

**زەرکەفت:** دەرمانێکی زەردی جوانە دەگیرێتەوەو لە ڕووی هەندێ چتان دەدرێ بۆ جوانی.

**زەرکووز** (باک.): دارێکە.

**زەرکی:** ڕەنگ پەڕیو، ڕەنگ زەرد.

**زەرگ:** ئامرازێکی شەڕێ بووە. شیشە ئاسنێکی درێژە دەروێشان لە ڕوومەت و لەشی خۆیانی ڕادەکەن ، فرۆکەی شێخان زەرگە فرۆکەوانیش دەروێشە. (هەر.) دەستەمەنجەل. (ئەردە.) لێدان، کوژتن، تۆپ لێدانی منداڵان لە تۆپی یەکتری، تێخستن.

**زەرگاڵ** (شەم.، هەورا.): زەنگاڵ، ڕەشکە، پێڵاوێکە لە موو و خوری دروستدەکرێ بۆ سەر بەفر و هیشکانیش باشە. (شەم.) لە لبادی سەر و بنی دروستدەکرێ.

**زەرگەتە** (کە.، بابا.): زەردەواڵە. زەردەزیرە. چژ. (باک.) مۆزقرتک. زەردۆڵە. زرکتک. زرگێتە. زلگێتە، ستینگ. (باک.) سێو، شاندەلیک. ناوی دێیەکییە لە سەرچناری خواروو لە سلێمانی.

زەرگەتە

**زەرگەر:** زێڕینگەر، زەڕەنگەر.

**زەرگەزەوی:** بڕوانە: زەرکەزەوی.

**زەرگەنج** (باک.): تاج، تانج.

**زەرگۆز** (زا.): پەڵک.

**زەرگووز** (باک.): جوورە دارە گوێزێکی زەردە.

**زەرگوون** (باک.): ڕەنگزەرد.

**زەرگێ** (باک.): ناوی ژنانە.

**زەرناس:** زەڕشناس. بەردی مەحەک، بە مرۆی زانا و شارەزای چتیش دەڵێن.

**زەڕنەقووتە:** زەڕنەقووتەڵمە، (هەورا.) ساقەتەسۆرە. بێچووە باڵندەیەکی تازە لە هێلکە هاتبێتەدەر و هێشتا تووک و پەڕی دەرنەکردبێ. پەنجەی بالآبەرزە، قامکی نێوەڕاست.

**زەڕنەقووتەڵە:** زەڕنەقووتە، جووچکە باڵندە و بێچووی ماڵاتان و ئاژاڵانە لەپێش پەڕ و تووک و موو دەرکردنێدا، پتر بۆ جووچکەی باڵندان بەکاردەبرێ، کە هێشتا پەڕ و تووکی دەرنەکردبێ.

**زەڕنگەر** (هەورا.): زێڕینگەر.

**زەڕنووما:** گوندێکە لە باکووری نسێبین دایە.

**زەڕنیخ** (ئەردە.، باک.): زەڕنیق.

**زەڕنیق:** زەڕنیخ. دەرمانێکی زەرد و قورسە لە دەرمانی گەرماوێ دەکرێ تا بەری پێ خاوێنکرێتەوە، بۆ موو خۆرکە و کەچەڵیش زۆر باشە دەکرێتە مەڵحەم. گۆیا لە(هەوشار) یش هەیە.

**زەڕنیگار** (هەورا.): بە زێڕ نەخشاو.

**زەڕوەڕەق:** قاقەزی زەرد، قاقەزی بە زێڕ ئاودراو یا نەخشاو. تاجی گوڵ، کە زۆرترین لەسەر گۆڕی ناوداران دادەنرێت.

**زەڕوەشان** (ئەردە.): شاباش، شاواش، زەڕاوشان، زێڕەوشان، بەخشیش، خەڵات.

**زەرۆ** (باک.): نێوی ژنانە.

**زەرۆڤار** (هەورا.): پارەگۆڕ، دراوگۆڕەوە.

**زەرۆلە:** باڵندەیەکی زەردی گچکەیە.

**زەروو:** (هەو.) زێروو، مارمژ. زاڵوو، زەلوو. زوورک. (وان.) زووری. زارووـ کرمێکی ڕەشی ئاوی دەم تیژە خووێنی پیس دەمژێ لە لەشی مرۆیان.

**زەرووگر:** کەسێکە بە پووڵ زەرووی بە لەشی ئەم و ئەوەوە بنێ.

**زەروزیوەر:** خشل، چەک.

**زەرهاتن:** بڕوانە: زەرەهاتن.

**زەرهەلی** (بار.): جوورە هەڵووچەیەکە.

**زەرێ** (باک.): نێوی ژنانە.

**زەرێڵە:** زەرباڤ، زەردەزیرە.

**زەری** (باد.): پەری، جووان، نازدار، دەلال. (باد.) پەری ڕوو، پەری ڕوخسار. لە مەقامە کۆنەکاندا بۆ پرچ زەرد بەکاربراوە. (باک.، باد.) جووان، کچی عازەب.

**زەڕی** (ئەردە.): زێڕباڤت، قولاپەچن، سمیچن.

**زەریا:** دەریا.

**زەڕیان** (فە.): زەڕین.

**زەڕیانی هەر** (فە.): زەڕینی کەر.

**زەریپ** (باک.): سنوور. جێگەی پێک گەیشتنی دوو چۆمان، دوو ئاوان.

**زەریجەک** (باک.): گیایەکە.

**زەریّ فیج** (باک.): زەردی کراوەوە.

**زەریقین** (زا.): هەڵاتنی ڕۆژ و تریسک و هۆڕی.

**زەرێلە** (باد.): باڵندەیەکی گچکەی زەردە، زەردی وەلی، جۆخۆرە.

**زەریم** (باک.): نێرگس، نێرگز.

**زەرین** (هەورا.): زێڕین. ــ کەمەر: زێڕین کەمەر. زەڕاندنی گوێدرێژ، سەرران. (هەورا.) سەرین. زرین. بەخۆفشین، لە خۆبایی بوون.

**زەرینۆک** (هەو.): گیایەکە.

**زەریوەن** (هەورا.): گیایەکی کوێستانییە بنجەکەی بە ووشکی دەهاڕرێ بۆ گۆشتە زوونە بە بریناندا دەکرێ و زۆر باشە.

**زەعف**: بێهۆشی، لە هۆش خۆچوون.

**زەعفەران** (ع.): گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی سووریاوە زۆر بەنرخ و بەکەڵکە بۆ دڵ ئێشە.

**زەعفەرانی**: چتێکە ڕەنگی وەکوو زەعفەرانی وابێ.

**زەغەرە**: زەخەرە.

**زەغەڵ** (باک.): گژوگیای گەندە، کە لەناو دەغڵ و داندا شین دەبێ. دەغەڵ، ساختەچی، تەنبەڵ.

**زەغەڵ**: دەغەڵ، قەڵب، تەوەزەل، تەنبەڵ. کەسێکە کارێکی لەدەستیشی بێ نەیکات. ساختە چی.

**زەغەڵی**: تەنبەڵی، تەوەزەلی.

**زەغەلی** (باک.): گیایەکە لەنێو دەغڵودان و بێستاناندا شین دەبێ و پەسند نیە.

**زەغچوون**: لەناو چوون، تەفرو تورنابوون.

**زەفت**: زەفت. زەوت، گرتن، داگیرکردن، زەوتکردن.

**زەفەران**: زەعفەران.

**زەفی** (باک.): زەوییەکە کشتوکاڵی تێدا بکرێ.

**زەق**: زق، زیت. (کە.) قوقز. چتێکە لە جێگای خۆی دەرپەڕیبێ. چاو ــ: چاوزیت، چاوبز، چاوداپچڕاو. نێوچەوانی ــ: نێوچەوانی دەرپەڕیو. دیواری زەق. پشتی سینیەکەی ــ ەو ناخێوێتە سەرزەوی.

**زەقاڵێن**: یەکینی.

**زەقانن** (ئەردە.): کەنانن، (ئەردە.) ترەقانن. وەپێکەنین خستنی منداڵ. زرووقاندنەوە.

**زەقە**: بزەی چاو. ــ ی چاوی دێ: بزەی چاوی دێ.

**زەقەزەق**: زیتەزیت، زەقزەقە. بە دووچاوان نوواڕین. زیقەزیق، چریکەچریک.

**زەقەڵ**: زەغەڵ.

**زەقەهاتن**: بزەبزی چاو، چاوی زەقەی دێ.

**زەق بوون**: زق بوون، زیت بوون.

**زەقزەقە**: زەقەزەق، بە دووچاوان نوواڕین.

**زەقکردن**: چاو زەق کردنەوە واتە بە دوو چاوان تەماشای کەسێک یا چتێک کردن و چاو لێ نەقووچاندن.

**زەقکردنەوە**: چاو زەق و بزکردنەوە.

**زەقنە**: چتێکە زۆر تاڵ و ناخۆش.

**زەقنەبووت**: ژەقنەمووت.

**زەقنەپووت** (زا.): ژەقنەمووت.

**زەقنەبووتکردن**: زەقنەکردن، ووتەیەکە بەکاردێنرێ بە سووکییەوە بۆ خواردنی چتێک لەلایەن کەسێکەوە.

**زەقنەمووت**: ژەقنە.

**زەقنەمووتکردن**: ژەقنەکردن.

**زەقنی هەلا**: ژەقنەمووت.

**زەقین**: پێکەنین بەدەنگی بەرز، بەقاقا پێکەنین، کەنین، زەقیان، ترەقین، ترەقیان.

**زەک** (هەورا.): قنچکە، قینچکە.

**زەکۆ** (ع.): ناوی ئافرەتانە لە (زکیە)وە کورتکراوەتەوە.

**زەگر** (زا.): ووردە بەردی شکاو و ووردبوو.

**زەگلێرە**: (بار.، بابا.) چلوورە. (هەورا.) پەیسە.

**زەل**: چڵە گیا یا پووشێکە. زل. قورەو. بە جوورە گیایەکیش دەڵێن، کە لەنێو قوڕیدا شین بێ. جەگەن، گیایەکی ئاوی و بڵند و سپی و سێ کووزە و سوورە بۆ کورتان دەستەدەدات و لە گووێ ئاوان سەوز دەبێ. (هەورا.) جوورە جەگەنێکە حەسیری پێ دروستدەکەن. گیایەکە قاقەزی لێدروستدەکرێ. تەرکە، گابر. جوورە قوڕە ڕەشێکە بەفنی پێ ڕەشدەکرێ و لە شوێنی گەراودا پەیدا دەبێ.

**زەڵاتە**: سەڵاتە، جوورە خواردەمەنییەکە لە ترۆزی یا خەیار و تەماتە یا لە سرکە و هەندێ چتی تر دروستدەکرێ.

**زەلاڤا**: تیرەیەکە لە کوردی ئامووده (عامووده) بەناو (دەقوریا) و (مەلا) دا بڵاوبوونەوە.

**زەلاکوولی** (باک.): گیایەکە.

**زەلاڵ**: زولاڵ.

**زەلام** (هەو.، بابا.، کە.): پیاو، مرۆ، مەرد، مەردوم. لاهێر، گەورە، مەزن، زلام، کەڵ، بەدیمەن. (بابا.) گیایەکە لە قەراغ جۆگە و نێو گولاتدا شین دەبێ، نیو بەژن بڵند و چڵچڵ و لووس و تەنها هەڵدەچێ. کابرا، هەرامە، وانێک. ووتەیەکە بۆ یەکێک بەکاردێنرێ کە ناوی نەزانرێ یا لەبەر بێ غوودی بەکاربرێ.

**زەلامەڕێ**: سەڵتەرێ، ڕێگایەکە تەنها زەلام بتوانێ پێیدا بڕوا نەک وولاغ و کاروان.

**زەلان** (هەورا.): بای شەماڵ، ڕەشەبا، زریان، زلان. ناوی دێیەکییە لە ناوچەی سرووچک.

**زەلانەوە**: حاوانەوەی کەسێک بەخۆڕایی.

**زەلاندن** (باک.): تیرژکردن (لە شلەمەنیدا). بزەلینە.

**زەلاندنەوە**: حاواندنەوەی یەکێک بەسەر یەکێکی تردا بە خۆڕایی و فیڕۆ.

**زەلە** (کە.): دەنگ، زایەڵە. (باک.) زللە. ــ دان: زللە لێدان.

**زەلەوبیان** (زا.): شلەژان.

**زەڵزەڵە**: زەرداو، ئاووهەوای برینان.

**زەڵزەڵۆک** (شکا.): خلیسک.

**زەلق**: لکان، چەسپین. *

**زەلکاو** (جا.): زناو، زەنەک، ئاوگیر. شوێنێکە ئاوی بۆگەنی تێدا وەستابێ و ناوبەناو گیاو زەلی تێدا ڕووابێ.

**زەلکە** (بابا.): جۆرە ترێیەکە. شۆرباوی برنجی بێتام. ناوی دێیەکییە لە هەورامانی ئێرانێدا.

**زەلکۆ** (ئەردە.): نەیزار، قامیشەڵان.

**زەڵم**: نێوی دێیەکیە لە هەورەمانێدا وتاڤگەیەکیش لە نزیک وێیە پێی دەڵێن زەڵم.

**زەلوو** (باک.): زەروو.

**زەلووت** (باک.): ڕووت.

**زەل و توول** (ئەردە.): چرپی، پەردوو، پردوو.

**زەلووتی** (باک.): ڕووتی.

**زەل و مۆر** (لو.): زیندەوار.

**زەلهان** (باک.): قومکران لە شلەمەنیدا. خوشین، خزین.

**زەلێن** (موک.): خووساندن، نەرمکردن. خلیسکێن، خلیسک پێکەر.

**زەلیقاندن**: چتێک بەچتێکەوە نووساندن.

**زەلین**: هەڵخلیسکان، هەڵزەلین.

**زەلینەوە**: زەلانەوە.

**زەما** (باجە.، هەورا.): زاوا.

**زەماخووا** (ئەردە): شیرینی زاوایی.

**زەماوەن**: زەماوەند، سوور، داوەت.

**زەماوەند**: شایی، بەزم، زەماوەن، هەڵپەڕین، داوەت، ئاهەنگ، کەیف و شادی، گۆوەند.

**زەمەق**: جۆرە گوڵێکی زەرد و سوور و سپییە گەڵایەکەی وەک گەڵای قامیشی وایە بەڵام پانترە.

**زەمەگلێرە** (بار.، کۆ.) چلوورە، مووم. ئەو شووشە سەهۆڵانە، کە بەگوێسوانە و داروبار و سوولاوکاندا شۆڕدەبنەوە خوارێ.

**زەمەن** (ئەردە.): سارد، توند، سەخت. زەمەند.

**زەمەند**: قاڕوون، چڕ، پەرچ. زۆر، گەلێک، پڕ، زەبەند.

**زەمەندایی**: زەبەندی.

**زەمبەریش** (باک.): سەنیر، سەرین، بالیف.

**زەمبەق**: زەمەق.

**زەمبەلەک**: (باک.) زەمبەرەک. فەنەر، زەنبەلەک.

**زەمبوورەک** (هەورا.): زەمۆرەک، دۆزەقەی ئاشی، (کۆ.) پۆسکە. دارێکە لەبنی دۆلاشی ئاشی دەگیرێ و کونێکیش لە نێوەڕاستیدایە. نەی، تێ ئاساو (نێ ئاساو).

**زەمبیل**: زەمبیلە، زەنبیل. دەفرێکی پووشینی دەم پەلە چتی تێدا هەڵدەگیرێ.

**زەمبیلە**: زەمبیل.

**زەمتە** (خۆ.): تەمبەڵ، تەوەزەل.

**زەمزەمە**: بەزم. لەسەرخۆ گۆرانی کوتن. هەراهەرا، دەنگەدەنگ. دەنگە دەنگێکە لەکاتی پەرستنی خودایدا لە موغانەوە دێ.

**زەمۆ**: نێوی ئافرەتانە.

**زەمۆرەک** (هەورا.): زەمبوورەک.

**زەمۆک** (هەو.): نێوی ئافرەتانە.

**زەمۆمە**: (کۆ.، خۆ.) هۆرەیە لە درزی داران دەکوترێ بۆ قەڵاشتنەوەی. (بابا.) پەواز. (خۆ.) دارێکە پەڕۆی تێ دەئاڵێنن و کونێکی پێدەگرن.

**زەموورەک**: تەندوورەی ئاشی.

**زەمهەڕ**: زمهاڕ، زمهەڕ. (کرما.، موک.)، زەوەر. دانەوێڵەیەکە برێتییە لە ئاردی (٥، ٦) مانگان. پاییزان، کە گەنم تابەهارێ لێکرێ دەڵێن: زەوەری لێکردووە، زەوەری هەیە. کاتی ــ: کاتی ئامادەکردنی دانەوێڵەی زستانێ.

**زەمی** (کە.): زەوی.

**زەمیلە**: زەمبیل، بەرچنە، بەرچینە، دەفرێکە لە توول و قامیش دروست دەکرێت.

زمیلە

**زەمین** (هەورا.): زەوی، خاک، ئەرد.

**زەمین بین**: زەوی پێو.

**زەمین پێو**: زەوی پێو.

**زەمین پێوان**: زەوی پێوان.

**زەمین پیم** (هەورا.): زەوی پێو.

**زەمین لەرزین** (فە.): زەلزەلە، بوولەرزە.

**زەن**: زەو، زاوزێ. (هەورا.) زەه. مەڕومالاتێکە زەوی تێکەوتبێ.

**زەنادی**: ئاڵقەو یا بازنەیەکی زێڕین وەیا زیوینە لەقۆڵی ڕووتدەکرێ و سەریشی وەکوو سەری ماری وایە لەسەر ئالقەکە ڕاکشاوە.

**زەنار** (باک.): زیننار.

**زەنە**: (هەورا.) زەنە. ئەم ڕیک (اشارە) یە (ە) کە بە ئارەوی (سکون) ی پێدەڵێن، هەرپیتێکی بێدەنگ کە بزوێنی نەبێ زەنەدارە وەکوو پیتی (ح، د) لە (ئەحمەد) دا.

**زەنەق** (ئەردە): زەندەق، زارە، زاوەر.

**زەنەخ** (ئەردە.): چەنەگە، گردی چەنەگە.

**زەنەقتۆقین**: ترسان، زاوورچوون، زراوچوون، زەهلەچوون.

**زەنەقدار**: نەترس، زاوەردار، زەهلەدار.

**زەنەقدان**: گردی چەنەگە. زەنەخدان، چاڵی چەناگە.

**زەنەک**: دەقن، زەلکاو. زنەک، زناو، زنە، تەڕەژن. (خۆ.) شوێنێکە ئاوی لێ دەرچووبێ و لەبەری بڕوات و گژوگیاشی هەبێ.

**زەنبەڕە** (شێخ.): دووزەلە. دووبلوێری لێک گرێدراوە.

**زەنبەرە** (باک.): زەنبەلەک. فەنەری کاتژمێر و هی تر، کە برێتییە لە تێلێکی کەمێک پان و درێژ و هەڵکراو بە خاوبوونەوەی کاتژمێرەکە لە کار دەکەوێ بە کۆک کردنی دەکەوێتە کار.

**زەنبوور** (لو.): زەردەواڵە، سیرەمۆزە.

**زەنبیل**: زەنبیلە، زەمیلە، بەرچینە. زەمبیل، نێوی دێیەکیشە لە موکریان.

**زەنبیلە:** زەنبیل.

**زەنج:** زەنگ، زەنگە، زەنجار. ژنگار، کرێژ، گەمارا.

**زەنجەفیل:** ڕەگی گیایەکی گەرمیانی و سپییە زۆر تونـد و تیژە ووشـک دەکرێت.

**زەنجیر:** (لو.) زنجیر، ئاڵقەرێز. ــ بەند: زنجیربەند.

**زنجیرە:** زنجیر.

زەنجیر

**زنجیرەبەند:** زنجیربەند.

**زنچ** (هەورا.): چەنەگە.

**زەنخ** (باک.): گەنیو، گەنی، بۆگەن. (باک.) خەنز.

**زەند** (فە.): گۆشتی قۆڵ. (باد.) زەندە، گۆڵەی دەرکییە. باسک. قـۆڵ. (مـوک.، ڕەوا.) مەچەکی دەست، (باک.) بەفشـک. باسـک. جێگـای بازنـە. هۆزێکی کـوردە کـەریم خـانی زەنـدی لێ هەڵکـەوتووە. (بـاک.) جومگە، جومگە. ناوی ئـەو ئێلـەی (شاپزنی) یـە یـا (شاه پەسنی) یە خۆیان دەڵێن (ئەم پسمامێ شاین)، کەریم خانی زەند پادشای کوردستان و خۆشی کوردبووە زۆر وێدەچێ، کە دانیشتووانی ئەو گوندە لـە پاشماوەی کەریم خانی بن.

**زەندا:** گوندێکە لە باشووری قامیشلوویە دەبێ لە ئێلی زەند بن.

**زەندئاڤێستا:** پەرتووکی ئاسمانی زەردەشتییە. زەندەڤەستا، زەنداوێستا واتە ئەنێستا، هەرێستا، مەبەس لەوەیە، کە هـەرکاتێ زەنـدا ڤێستا بخوێنرێتەوە بۆ ئەوکاتە دەبێ.

**زەندە** (باک.): زەند، گۆڵەی دەرکێ. دەرکی پێدادەخەن.

**زەندەزیرە:** زەردەزیرە.

**زەندەشۆر:** چووارقـاپ، چارقـاپ، جوورە سـەگێکە زەنـدی لای پاشـەوەی هەر چووار پەلـەکانی لەسەر زەوی دادەنێ.

**زەندەڤەستا:** زەنداڤێستا.

**زەندەق:** ئایین، لە زەندیق وەرگیراوە. کۆم، دین، زەهلە. (کـە.) ئـەترەش. (ڕۆژ.) زەنەق. ئـەترە، هـەترەش. زراو، ووره، ــ ی چوو: کۆمـی لێکرد، وورەی بەردا.

**زەندەق چوون:** تۆقین لەترسان.

**زەندووک** (باک.): قۆڵ پێچێکە لەکاتی کار کردنێدا دەکرێتە قۆڵ.

**زەندۆر**(ڕەوا.): زەندۆڵ.

**زەندۆڵ:** خەمخۆرک. (هەو.) زەوییەکە ڕووکاری دەرەوەی ڕێک و بێ پەڵـە و بێ خەوشبێ بەڵام بنەکەی فشبێ کە پێی لێ نرێ ڕۆبچێ یا برووخێ.

**زەندۆڵ** (خۆ.): خرێکی گەورەیە ئاو دەرببێتی سا ئاوی تێدا ڕاوەستابێ یا نا. (ڕەوا.) شوورێنێکە ئـاو بـەبنیدا ڕۆچێتـە خووارەوە. (دزە.) جێگایەکە گڵەکەی ڕزیبێ. درز وقەڵشتی زەوییە گەورەبێ یا گچکە.

**زەندی:** زەندیـق، زەندیـک، زەردەشـتی، پـەیڕەوانی زەنـد، زەنداوێسـت. (باک.) زیندی. ساخ، زیندوو. (باک.) زیندەوارە وەکوو کێـچ ومێشـوولـە و ئیتر.

**زەندیق:** زەندی، زەندی خوێن، پەیڕەوی زەنداوێستا.

**زەنگ:** چینگ. چانقۆچ. چان، لـە زەنگوڵـەی گـەورەترە. ــ ی کلیسـایە: جمخار. ڕۆنی ــ: کەرەی تووواوە، تەواش، زرنـگ، ڕۆنـی ئـاوتی، پـاک، زەلاڵ، خاوێن، ووشک. وێژە. (باک.، فە.) بزنێکـە گـووێ و لمووزی وەک شیری سپی بێ. (جا.) درز، قەڵەشت، قڵیش. ــ بردن: درزبردنی چت: ترەکبردن. (باد.) ئاوزەنگی. (باک.، فە.) ژەنگ، گەمار. ــ گرتن: ژەنگ گرتن. ــ ئاڤێتن(باک.): ژەنگ گرتن.

**زەنگار** (ئەردە.): ژەنگاڵ. زاخی سەوز، جەوهەری گۆگرد.

**زەنگارۆ** (باک.): ژەنگاوی.

**زەنگاڵ** (ئەردە.): زەندەک. (موک.) گۆرەوی ئەژنۆیان، گۆرەوێکـە لاسکی هێندە درێژ بێ بگاتـە ئـەژنۆیان، لـە چەرمیش دروستی دەکەن. هێشووی داڵ.

**زەنگان:** شارێکی کوردانە لە کوێستانێدا لە نێوانی قەزوێن و بیجار و هەمەدانێدا، ناوی گوندێکیشە لەناو هەڤێرکاندا.

**زەنگە:** (خۆ.) زەوییەکە شینایی هەبێ نیشانەی ئەوەیە، کە زەوییەکە شێ و نمی هەیە بەڵام ئاو لەژێر زەوی دەرنەهاتبێ. گە، جومگەی لوولاک بی یا هی پێ یە لەسەرەوە لەنێوانی، دوو گوێزینگەکاندایە. (کە.، ڕۆژ.) داری وورد و شکێنراو بۆ سووتاندنی.

**زەنگەتە:** (هەورا.، کۆ.) تیلماسـک. ترماسـک، ترنـاچک،(خـۆ.) گووارکە. (ڕەوا.) گووارە، بەرگووارە. (جا.، هەورا.) تیسـک. (ڕەوا.، خۆ.) ترناسک. (دەر.) تلماسک. (دزە.) تلمیسک. (هەو.) تلیسـک. چنجک. لیسک. ــ ی ترێ: لک و قوڵێکی هێشووە ترێ. زەردەواڵە.

**زەنگەتەلیشە** (شا.): داری قەڵاشکەری.

**زەنگەزێرە** (بابا.): ژەنگە سوورە.

**زەنگەسۆرە** (کۆ.): ژەنگەسوورە.

**زەنگە سوورە:** ژەنگە سوورە.

**زەنگەقڵیشە:** مووره داری ووشکی بە تەوور لەتکراو و قڵیشێنراوە.

**زەنگەلۆر** (باک.): زەنگە لۆرک.

**زەنگەلۆرک** (باک.): زەنگەلۆر. باڵندەیەکە.

**زەنگەمن** (بابا.، هەورا.): قولـنگ، قولـەنگ، پاچ. جـوورە پـاچێکی گەورەی لووت درێژی کەوانەدارە.

**زەنگەنە:** هۆزێکی کوردە لە قەراغ کەرکووکێ دادەنیشن.

**زەنگەنـەی گـەردەکـان:** نێـوی هـۆزی زەنگەنـەبووە لەسـەدەی چاردەمینێدا، لە کەناری هەمەدانێ دادەنیشتن.

**زەنگبردن:** درزبردن، ترەکیان، شکیان.

**زەنگزەنگ:** چتێکە درزی زۆری تێبووبێ.

**زەنگ زران:** مەبەس لە ئابڕووچوونە.

**زەنگ کوت:** زەنگ لێدەر.

زەنگڵ

**زەنگڵ** (باک.): زەنگوڵە، زەنگی چکۆڵە، زەنگ.

**زەنگلاندن** (باک.): زەنگوڵە لێدان. بزەنگلینە.

**زەنگلە:** زەنگوڵە.

**زەنگلوونانک** (باک.): باڵندەیەکە.

**زەنگلین** (باک.): زەنگ لێدران. بزەنگلە.

**زەنگن** (ئەردە.): زەنگمن، قولـنگ (بۆ هەڵکەندنی خاک و دیوار و چتی تر).

**زەنگنە:** زنگنە.

**زەنگۆ** (باد.): ئاوزەنگی. (باک.) ژەنگاوی.

**زەنگۆگرتی**: ژەنگاوی.

**زەنگۆڵ**: ئەژنۆ، زرانی، چۆک.

**زەنگۆڵە**: زەنگولە.

**زەنگۆڵ و منچک**: گیایەکی پنج دارە وەکوو گسک تۆوەکەی وەکوو زەنگوڵە وایە.

**زەنگ و قۆڕ**: زەنگی گەورە و گچکەیەو دەنگی زەنگوڵەی گەورە و گچکەی پێشەنگی قەتارانە یا بە چەرخ و فەلەکانەوە. زەنگ و هۆڕ.

**زەنگۆگرتی** (باک.): ژەنگاوی.

**زەنگول**: زەنگوڵە.

**زەنگۆڵ** (هەورا.، جا.): ئەژنۆ، چۆک، ڕزانی، رووژنگ.

**زەنگول**: تەپلەسەری شاخ. تنۆک، تنۆکە بۆ فرمێسک و ئارەقەی ڕوون بەکاردەبرێ. ـــ ی ئارەقە بەڕوویدا هاتە خوارێ.

**زەنگوڵە**: زەنگل، دێژامورو، زەنگی گچکەیە بەملی ئاژاڵانیەوە دەکەن تا ماری لێ بڕەوێتەوە لە پێ و ملی منداڵیش دەکرێ. (هەورا.) هێچک. دارێکە بۆ شەغرە یا بۆ هەر چتێکی بەکاربرێت. (هەورا.) ئەژنۆ، چۆک.

**زەنگوڵە و بنچک**: گیایەکی پنجدارە وەک گسک تۆوێکی دەگرێ وەکوو زەنگوڵە وایە.

**زەنگوڵەمیرە** (موک.): باڵندەیەکە.

**زەنگوڵەزیوە**: باڵندەیەکی گچکەی ڕەنگینە زۆرجاران هێلانەی لەسەر دارە هەرمێ و بەڕووی بە قوڕو پووش دروست دەکات.

**زەنگوڵزەنگوڵ**: تنۆک تنۆک بۆ ئارەقە و فرمێسکی ڕوون بەکاردەبرێت.

**زەنگووڵ**: زەنگوڵ.

**زەنگ و هۆڕ**: زەنگ و قۆڕە، شرنگین. دەنگی زەنگی گەورە و زەنگوڵانە.

**زەنگوو** (باک.): ئاوزەنگی.

**زەنگوون** (زا.): زەنگین.

**زەنگی**: قولەڕەش، زەنگباری.

**زەنگی ئاگایی**: زەنگی دەنگدان.

**زەنگیالێ** (هەورا.): زەنگیانە.

**زەنگیانە**: خاکی، جوورە موورووێکی زۆر ووردە و گەلێ ڕەنگی هەیە.

**زەنگی کلیسایە**: جەمخار.

**زەنگین**: دەوڵەمەند، (باک.) خووەدی، قەرێژ، سامانداز، خووەدی ـــ گەمار.

**زەنوێر** (موک.): مەڵبەندێکی خۆش و دڵگەرەوە و بەرگوشابێ.

**زەنی** (باک.): چەنە، چەنەگە.

**زەو**: زاوزێ.

**زەواد** (موک.): زاد، تۆشە، تێشو، پێ بژیو. بۆ سوورێندیش بەکاردەبرێ.

**زەوە**: برینێکی پیسە لە خواردنی گۆشتی ئاژاڵی دەرد مردەوە پەیدا دەبێ و جێگایەکەشی دوای چابوونەوەشی چاڵ دەبێ.

**زەوەڕ** (موک.): زەمهەڕ. دانەوێڵەی زستانییە ئاردی (٥، ٦) مانگانە، پاییزان کە گەنم تا بەهاری لێ کرێ دەڵێن: ـــ ی لێ کردووە یا هەیەتی.

**زەوەزە** (ڕەوا.): زاوزێ.

**زەوەوزۆ** (خۆ.): زاوزۆ. بە ـــ: بە زاوزۆ.

**زەوەن**: گورگەی گووێسوانە. زەوەند.

**زەوەند**: زۆر زۆر، ئێجگار زۆر، گەلێک، زەعەف، زەبەند، زۆرووزەوەند.

**زەوت**: ڕاسەر. داگیر، زەفت. ـــ کردن: داگیرکردن، دەست بەسەردابڕین، ڕاسەرکرن، دەست بەسەردا کێشان، دەست بەسەردا گرتن. پێ وەستان، دەرەقەت، هەرچەند دەکەم ـــ ی ناکەم: واتە پێی ناوەستم و دەرەقەتی نایەم. زفت، ئەوەیە، کە لەگەڵ قیلی تێکەڵ دەکرێ.

**زەوتەک** (باک.): لەخشتەبەر، فریودەر.

**زەوتەلی** (باک.): خۆڕستی، مەهرکی.

**زەوتکردن**: زەفت کردن، داگیرکردنی چتی ئەم و ئەو بە ناڕەوا. دەرەقەتیهاتن، هەرچەند دەکەم زەوتی ناکەم واتە دەرەقەتی نایەم.

**زەوتی**: چتی زەوتکراو و داگیرکراو.

**زەود** (زا.): بێکار.

**زەودێلە** (گەر.، باک.): گۆڕەوی چنە، گۆریە چنە (باڵندە).

**زەوور** (فە.): زوورر، دڕ، زبر، زۆر، تین، هێز، تەووژم. ـــ ی (فە.): زووری، دڕی، زبری.

**زەوزان**: زۆزان، هاوینەهەوار، هاوینەوار، کوێستان، ئێلاخ.

**زەوڵە** (ڕەوا.): مەچەک.

**زەوڵەئەستوور**: مەچەک ئەستوور.

**زەولەستوور** (ڕەوا.): مەچەک ئەستوور.

**زەولەک**: کەسێکە لاق و بەلەکی ئەستوور و قەڵەو و گەورەبێ. زەبەللاح، لەندەهۆر، فیلەتەن، زرتەزەلام. لاق و پۆزی مرۆیانە.

**زەوۆک**: زگکەر، بەزاووزۆ، ئافرەتێکە منداڵی زۆر ببێ.

**زەوونج** (ئەردە.): شێدار. زۆنگ، شەدار.

**زەووق**: شارێکی کوردانە لەناو خەرزاندا.

**زەووق و زۆقەند**: دوو شاری بچوکن لەناو خەرزاندا.

**زەوونگ**: زەوونج. موواز، دۆڵمەجەرگ، دۆڵمەیەکە لە ڕیخۆڵە مەڕی، کە پڕ دەکرێ لە برنج وقیمە.

**زەوی**: ئەم ئەستێرە گەورە و گەرۆکەیە، کە ئێمە لەسەری دەژین، پارچەیەکیشە لە دەشتێک بۆ شینایی و کشتوکاڵ. ئەم ـــ یە بەراوە و هێوەی تر دێمە. کاد. حەرد، حەرز. بووم. ئەرد، هەرد. خاک. زەمین. (فە.) زەوو. زەمی. بەژ، هەرد. (ئەردە.) زەوین. کەلاک. ـــ قەڵشتوو: خرپە.

**زەوی بە چنگ هەڵکەندن**: مەبەس لەئێش و ئازاری زۆرە.

**زەوی پێو**: کەسێکە زەوی بپێوێ.

**زەوی پێوان**: پێوانی زەوی.

**زەوی دێم**: بەژ، بەژاف.

**زەوی زار**: زەوی و زار.

**زەوی کێڵ:** جووتیار، کێڵەر.

**زەوی کێڵان:** جووتکردن.

**زەوین** (شوڕا.): زەوی.

**زەوی ناس:** (باک.) ئەردەبێژ.

**زەوینە:** زەمینە، جێگا، هەل.

**زەوی ناسی:** ئەردناسی.

**زەوی نەچێنراو:** (باک.) بەژی.

**زەوی نەکێڵراو:** (باد.) مەرز.

**زەوین بێ گیا:** گرکە زەوی.

**زەوینخۆشکریاگ:** زەوی خۆشکراو و ئامادە، مەزرا، کێڵگە.

**زەویزێخدار:** زەوی زیخدار.

**زەوینسەخت:** ڕەقان.

**زەوینگیر:** مەبەس لە مەردوومی داکەوتووی پیری گردەنشینە.

**زەوین نەرم:** نەرمان، زەوی فش و نەرمان.

**زەوی و زار:** کێڵگە، شوێنێکە، کە کشتوکاڵی تێدا بکرێت.

**زەه** (هەورا.): زاوزێ.

**زەها** (باک.): زەبەڵلاح، زەهار، لەندەهۆر، فیلەتەن. (ئەردە.) زێی گیانداری مێیینەیە، ماڵ، کوز، کوس، قوز، شەرمگا. (ئەردە.) ژەک.

**زەهاک:** زەهەک، زاییینی ئاژاڵ: ڕانەکە زەهەکی تێکەوتووە، واتە دەستیان کردووە بە زایین و کار و بەرخ بوون.

**زەهاو:** مەحاڵێکە لە سیروان بەو پەڕەوە تا دەگاتە قەسری شیرین. درێژایی بە پێیان سێ ڕۆژ و پانایی ڕۆژێکە. شوێنی ئاوەزێ، زناو، زنەک، زوهۆر، زق، ئاوەزا، ئاوەزۆ.

**زەهەک:** زەهاک.

**زەهر** (فە.، هەورا.): ژەهر.

**زەهراوی:** ژەهراوی.

**زەهرەترەک:** زارەترەک.

**زەهرەترەک بوون:** زارەترەک بوون.

**زەهرەترەک کردن:** زارەترەک کردن.

**زەهرەمار:** ژەهری مار، ووشەیەکە بە جنێو بۆ یەکێک بەکاردەبرێ، دە ـــ ەکەت بخۆ.

**زەهرەمارکردن:** مەبەس لە خواردنێکی بێ دڵی و خەفەتبارییە.

**زەهروویین** (باد.): لاسایی کردنەوە.

**زەهرچاو:** زارچاو، بە ڕق و پشمەوە تەماشاکردن.

**زەهرخەنە** (ئەردە.): زارخەنە.

**زەهردار:** ژەهردار. ـــ ی: ژەهرداری.

**زەهردان:** ژەهر دەرخوواردان، ژارخوورانن.

**زەهرکردن:** زەقنەکردن، بەژەقنەمووت کردن.

**زەهرمار** (فە.): ژەهری مار، گووژاڵک، زراو، نەترە.

**زەهری هەلاهەلا:** ژەهری هەلاهەلا. جوورە ژەهرێکی کوژندەیە لە گیا دروستدەکرێ.

**زەهف** (باک.): زۆر. ـــ کردن: زۆر و پترکردن.

**زەهفان** (باک.): دەستە، جۆم، کۆمەڵە.

**زەهفتر** (باک.): پتر.

**زەهلە:** زراو، ووره، بەشارەت. (کە.) ئەترەش، زەندەق. (ڕۆژ.) زەنەق. بڕۆن. ـــ چوون: زەندەق چوون. ـــ بردن: زەندەق بردن.

**زەهلەبەر:** تۆقێن، تۆقێنەر.

**زەهلەبران:** زەهلەچوون.

**زەهلەبردن:** تۆقاندن، ترساندن.

**زەهلەچوون:** تۆقین، ترسان.

**زەهلەک:** زراو.

**زەهمان** (باک.): گۆڕستان.

**زەی:** زەوی.

**زەیت:** لە زەیتوونی وەردەگیرێ و ڕۆنی زەیتوونێیە.

**زەیتوون:** جوورە درەختێکە بەرێکی چەوور دەگرێ بە خۆشکراوی دەخورێ و ڕۆنیشی لێ دەگیرێ بە بەرەکەشی هەر دەڵێن زەیتوون.

**زەیرە** (مەر.، شێخ.): بەیداماڵی. جوورە دارە هەنجیرێکە بەری سەرەتایی دەوەرێنێ تەنها چەند دانەیەکی پێوە دەمێنێ، کە باقۆی پێدەڵێن، بەهاران لەپێش هەموو هەنجیرێکیدا پێدەگەن.

**زەیستان:** زیستان.

**زەین:** زەیین.

**زەینەڵ** (باک.): ناوی میرێکی کوردانە.

**زەینالی:** ئاواییێکی جوان و بڵندە لە ئاوایی شاری حەسکێف (حەسەنکیف) و (هەسکێف) دایە کوردی ئەو ناوە زۆری پێهەڵدەڵێن، ئەو شارە پایتەختی خانەدانی ئەیووبی کورد و پاشماوەی شاهەنشایەتی ناوداری کورد سەلاحەدینیە.

**زەینەڵ:** نێوی پیاوانە.

**زەینۆ** (ع.): ناوی ئافرەتانە لە (زەینب) ەوە کورتکراوەتەوە.

**زەینی** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**زەیی** (باک.): پوورە، دەستە مێشەنگوینێکە.

**زەیمان:** زەیستان.

**زەییستان:** بۆ ژنێک بەکاردەبرێ لە ڕۆژی زانیەوە تا چل ڕۆژان، بۆ تازە زاوایش بەکاردەبرێ.

**زەیین:** هێزی بیر و تێگەییشتن، فیسارەکەس زۆر بە زەینە.

**زەیینڕوون:** کەسێکە زوو لە چتان بگات. ـــ ی: زوو لە چتان گەیشتن.

**زەیین کوێر:** کەودەن، نازیرەک. ـــ ی: کەودەنی، نازیرەکی.

**زبارە:** (هەو.) هەرەوەز. فەزحە. یاریکاری و یارمەتی یەکتریدان بەدەستە و کۆمەڵە لەکاری جووت و دروێنە و هەر چتێکی تر دابێ.

**زبان:** زمان، (باک.) ئەزمان.

**زبانه:** بلێسه. ـــ ی ئاوری: زمانەی ئاوری. (هەورا.) زبان. سەری دارێکی لەکراو و دادراوە تا لە کونی دارێکی ڕابکرێ. زمانە. ئاسنێکی باریکە لە ئاوزوونەدا دەچێتە کونی قایشەوە. زمانە.

**زبانە بچکۆڵە:** پارچە گۆشتێکی باریکە بە مەلاشووەوە نووساوە لە نزیک قوڕگ.

**زبانبەد:** زمانبەد. ـــ ی: زمانبەدی.

**زبانپاک:** زمانپاک. ـــ ی: زمانپاکی.

**زبان پیس:** زمان پیس. ـــ ی: زمان پیسی.

**زبان تاڵ:** زمان تاڵ. ـــ ی: زمان تاڵی.

**زبان درێژ:** زماندرێژ. ـــ ی: زماندرێژی.

**زبانزان:** زمانزان. ـــ ی: زمانزانی.

**زبانشکان:** زمانشکان.

**زبانشکاندن:** زمانشکاندن.

**زبانشیرین:** زمانشیرین. ـــ ی: زمانشیرینی.

**زبانگەزتن:** زمانگەزتن.

**زبانگیران:** زمانگیران.

**زبانلووس:** زمانلووس. ـــ ی: زمانلووسی.

**زبر:** (کە.، هەورا.) بۆ چتێک دەبێ، کە لووس نەبێ. کەماچ، زراوورتی، ڕووش، زوور، گر، گڕ، دڕ، دڕن. بۆ چتێک دەبێ کە وورد نەبێ بەڵکوو درشتبێ، ئەم ئاردە زبرە: ئەم ئاردە درشتە.

**زبرە:** سەرکۆزەری ساوار و قەرەخەرمانی هاڕراوە.

**زبران** (کە.): زەوی بەردەڵان.

**زبری:** زووری، دڕی، گری، گڕی.

**زبڵ:** خەوش و خاڵ، پلوپووشی ناوماڵ. خشت و خاڵ، کرش و کاڵ، (ڕۆژ.) توون. (شکا.) کرس. خۆڵ و خاش، پووش و پەلاشی ناوماڵ و ئیتر. ـــ کردن: زبڵ بە زەویدا کردن.

**زبڵچی:** کەسێکە کرش وکاڵی ماڵ و دووکانان کۆبکاتەوە و بیڕێژێ.

**زبڵدان:** سەرگوێلک، زبڵگە، سەرانگووێلک. گووفەک، سەرەنوویلک.

**زبڵڕێژ:** زبڵچی.

**زبڵکێش:** زبڵچی. ـــ ی: کرش وکاڵی ناوماڵ و دووکانان کۆکردنەوە و فڕێدانی.

**زبڵگە:** سەرگوێلک، سەرانگووێلک، زبڵدان، گووفەک، سەرنووێلک.

**زپرکە:** زیپکە.

**زپک** (زا.): زیپکە.

**زپیک** (باد.): هەژمارێکی سێ ڕۆژییە دوای سەرمای پیرێژنێیە دەڵێن لەوانەیە کلکی بزنێ ڕەق بکات. (هەو.) پیت.

**زجێف** (باک.): کەنار، نەخش. ـــ کرن: کۆکردنەوە.

**زچ:** داعبایەکی سوورکەڵەی بچووکی چنگنە بە ئاژاڵانەوە دەنووسێ. (کە.) یارمەتی. ـــ کردن: یارمەتیدان.

**زچلو:** زونگاو، زۆنگاو.

**زچین** (بزچە): چاوئێشان.

**زخ** (باک.): سەخت.

**زختە** (کە.): نەقیزە.

**زدک** (هەورا.): زیپکە.

**زر** (باک.): دڵکراوەوە.

**زڕ** (باک.): لەندەهۆر، زەبەللاح. زل. بەسەری هەر ناوەکەوە بنووسێ تێکەڵی نزیکی نیشاندەدا. بێ بنەچەکە، ناخانەدان، بیانی، پیارە، کۆڵەوەس. زڕدایک، زڕبرا، زڕخوشک. زڕباب: باوەپیارە. بێ بەر. داری زڕ: داری بێ بەر. (باک.) زەڕەی کەر و ئێستر. (کە.، ئەردە.) ووشک، برنگ. تەنها بۆ دەغڵ ودان دەبێ.

**زڕازڕ** (زا.): زەڕەزەڕ.

**زراسک** (باک.): ساوا. زارۆی ـــ : منداڵی ساوا.

**زراف** (باک.، باد.): باریک، زراو. زراوی نێوزگ، تالاو. (زا.) چتی وورد.

**زرافی** (بابا.): جوورە ترێیەکە.

**زرالات** (باک.): بەردی پان و گەورە، تات، تاتەبەرد.

**زڕان:** هەڵزڕان، هەڵڕژان، بلاوبوونەوە و دەنگدانەوەی دەنگ و باسێک لەنێو مەردوماندا.

**زڕانەوە:** دەنگدانەوەی زەنگوڵە و جام و چتی تر.

**زڕاندن:** هەڵزڕاندن، دڕاندن، دەنگ لە زنجیر و زەنگوڵەوە هێنان. زرینگەی زەنگوڵە. بلاوکردنەوەی دەنگ و باسێک بەناو مەردوماندا.

**زڕانن** (ئەردە.): زڕاندن.

**زرانوو** (فە.): چۆک، ئەژنۆ، زرانی.

**زرانی:** ئەژنۆ، چۆک، ووژنک، زرانوو.

**زرانی بەزرانی** (ئەردە.): چۆک بە چۆک.

**زراو:** زاڵۆ، زارە. (کە.) زارۆ. (ڕۆژ.) زاڵە، زالوو. زارەترەک، زەندەق، کۆم، دین، زەهلە، ئەترەش، زەنەق، نەترە، هەترەش، زاوور. ـــ بردن: تۆقاندن، زەندەق بردن. ـــ چوون: تۆقین، زۆر ترسان. توورەکەی زراوێ، کە بەنێوەڕاستی کەلێنی دوولۆی جەرگەوە نووساوە دڵۆپ دڵۆپ بەسەر ئاشک (گەدە) دا دەتکێ تا خواردن بتاوێتەوە. (هەورا.) تاڵە. زەرداو. باریک.

**زڕاو** (کە.): دەنگ لە زنجیر و زەنگوڵەوە هاتوو.

**زراوبردن:** تۆقاندن، دڵهاندن، زەهلەبردن.

**زراوتۆقین:** مەبەس لە زۆر ترسانە.

**زراوچوواندن:** تۆقاندن، ترساندن.

**زراوچوون:** تۆقین، زەهلەچوون، زراوترەکبوون، زاڵەتەقین، زراوتۆقین.

**زراوشان** (ئەردە.): زێڕەوشان، شاباش.

**زڕە** (هەورا.): زرینگە، زەڕە، زرنگە. دەنگی زەنگ و زنجیرییە، بۆ دەنگی پارە و پارچە مسی گچکەش بەکاردەبرێ، بە دەنگی فڕەی فڕینی باڵی باڵندانیش دەڵێن.

**زرە** (زا.): زرێ.

**زڕەئەسپیندار:** پەڵک. جوورە چنارێکی جەوهەردارە بەلان وەکو چناری ڕاست و چاک نیە گەلای خڕترە، بەرەکەشی وەقۆرەی دەچێ و ناخورێ.

**زڕەبلبل:** جووره باڵندەیەکی بۆره وەکو فیقەگوڵەی وایە وەکو بولبولی دەخوێنێ.

**زڕەپۆلیە:** زڕوپۆلیە.

**زڕەدێو:** زەلام، ناقۆڵا، ناهەموار، زەبەللاح، لەندەهۆر.

**زڕەزڕ:** زرینگە زرینگی یەک لەدوای یەکتری، زرنگە.

**زڕەزیپ** (باک.): گموج، گێل.

**زڕەقیان** (ئەردە.): پێکەنین بە دەنگی بەرز، قاقاکردن، بەقاقاپێکەنین، ترەقیان، کەنین.

**زڕەک:** وولاخێکە ڕەشکێنەی چاوی سپی بێ.

**زڕەکەو:** سوێسکە، (ئەردە.) پۆڕ.

**زڕەکبوون:** بەشەواره کەوتنی بزن و مەڕ بەهۆی برووسکەوه.

**زڕەگەنە** (هەر.): گیایەکی کوێستانییە گەڵای وەکو سڵقی وایە بەری وەکو گوێزییە و ناخورێ تۆوەکەی وەکو هی وێنجەی وایە ئەگەر بێتوو تۆوەکەی تێکەڵ بەنان یا تووتنی جغاره بکرێ زۆری لێ بەردەبێ و پێی سەرخۆشیش دەبێ، گیایەکە بۆنی ناخۆشە گوڵی سپی یا زەرد و خڕە، کە ووشک بۆوه دەبێتە چتێکی خڕی دڕاوی.

**زڕەمێر:** شینەزەلام، لەندەهۆر.

**زڕەوەلی** (هەورا.): گیایەکی درێژی توکمەیە وەک قامیشی وایە لە گوێ ئاوان دەڕووێ.

**زڕکەتاڵ:** جووره کاڵەکێکی زرکی تاڵە.

**زڕب** (ئەردە.): چتی زل و قەڵەو، درشت. (ئەردە.) زبر، زوور، دڕ، گڕ، گرنج، گرنج گرنج.

**زڕباب:** (ڕۆژ.، هەورا.، بابا.) باوەپیاره. (باک.) زڕباڤ. زڕباو، زڕباوک.

**زڕباڤ:** زڕباب. منداڵێکی بابی مردبێ یا دایکی بەرەڵا کرابێ مێردێکی تری کردبێتەوه مێردی دووەمی دەبێتە زڕبابی.

**زڕبان** (ئەردە.): شوورێنی بەردەڵان، خیزەڵان، زیخەڵان، خرپ، ڕیزەخاڵ.

**زڕباوک:** زڕباب.

**زڕبە** (ئەردە.): زبرەی چت، درشتی چتی کەپەک.

**زڕبەهر:** پەست، نزم، بێ بەهره. ــ کرن: پایەکەمکردنەوه، بێ بەشکردن.

**زڕبرا:** برایەکە لە دایکی مرۆ یا لە باوکی بێ، باب برا، دایک برا، برایەکە لە بابەوە یا لە دایکی مرۆیەوه بێ.

**زڕە:** ئاودانی پێشەکی تۆوی چاندراوه.

**زڕبراڵە** (هەورا.): زڕبرا.

**زڕبوورا** (باک.): زڕبرای ژنێ.

**زڕبی:** زبری.

**زڕپی** (ئەردە.): زبری، گرنجی.

**زڕپ:** زبر. زیندوو، زرپ و زیندوو.

**زڕپە** (کە.): لەناکاو لێدان.

**زڕپەنگ:** (بابا.) خەرپونگ. زڕپونگ.

**زڕت** (باک.): خۆهەڵکێشان، بافیش.

**زڕت:** جڕت، جڕتە، زڵت. ــ بە زاری لێدان: جڕت لێدان، جڕتە بە زار یا بە پاشەوه. ــ لێدان: جڕتاندن. ــ ڕاهێشتن: جڕت ڕاهێشتن. (باک.) بانگکردنە بۆ شەڕێ، دەنگی شەڕێیە، دەنگهاتن لە شەڕێدا. بەسەرڕژیشتن، سەرزەنشتکردن. (ئەردە.) زیت، زەق.

**زڕتە:** زەقە، زیتە. ــ ی چاو: زەقەی چاوی دێ.

**زڕتە** (کە.): زەلامی، ناقۆڵا، زڕتەزەلام، لەندەهۆر. زیتە. ــ ی چاوی هات: زەقەی چاوی هات، دەینوواڕی.

**زڕتەبۆز:** زەلامێکی گەوره و بە خۆوه، زەبەللاح. زڕ، لەندەهۆر. قسە زل، قسە زان.

**زڕتەجۆیی** (باک.): زۆر، جەوڕ، بێدادی.

**زڕتەخانە:** بڕوانە: زڕتخانە.

**زڕتەزڕت:** زەقەزەقی چاو، زیتەزیت.

**زڕتەک** (باک.): قەشمەرجاڕ، تیزەجاڕ، کەسێکیشە خۆی هەڵبکێشێ و گەڵێک زڕت و فۆڕتان بکات.

**زڕتخانە** (باک.): مەیدانی گەمەو پێشبڕکە. فشە و قەشمەری، قەشمەریجاڕ.

**زڕتۆلە** (باک.): فشە، قەشمەری و گاڵتە بە یەکێکی کردن. بەردی گچکە.

**زڕتوو** (هەورا.، دەر.) تووی کەڕە. تووشەڵە.

**زڕتی** (ئەردە.): بێکارەیی.

**زڕت و پڕت:** جڕت و فڕت، جڕتوپڕت، واتەی بێ ڕێو جێ.

**زڕتی** (ئەردە.): بێکاره، هیچ لێ نەهاتگ، دەست لێ نەدراو، پشتگوێ خراو.

**زڕچ** (باک.): چیمەن، شینایی، زڕچک.

**زڕچک** (باک.): چیمەن، شینایی، زڕچ، گیای پڕو سووکە، زوور چک.

**زڕچۆنە** (باک.): چەنەسووک.

**زڕخ** (باک.): زرێ، زرە. کراسی ئاسنە بۆ شەڕێ لەبەردەکرا.

**زڕخەسوو:** زڕخووەسوو.

**زڕخووەسوو** (باک.): زڕخەسوو.

**زڕخوشک:** ئافرەتێکە لە دایکەوه یا لە بابەوه خوشکی مرۆی بێ.

**زڕداک** (هەو.): زڕدایک.

**زڕدایک:** (هەو.) زڕداک. (باک.) دێماری، ژنباڤ، زڕدێ. (باک.) داماری. (بانە، بابا.) باوەژن. (دەر.) زڕداڵک. (هەورا.) دێدی.

**زڕدش** (باک.): زڕ ژنەخوشک.

**زڕدێ** (باک.): زڕدایک.

**زڕز** (باک.): چەمووش، شەموز، بۆوولاخێک بەکاردەبرێ، کە بەئاسانی ڕێی سوواربوون یا بارکردنێ نەدا. شووم.

**زڕزارا** (باک.): زڕوارا، تیڵێکی کوردی ناوداره لەناو لەشکری شاهەنشایەتی سەلاحەددینی ئەیووبیدا.

**زڕزاوا:** لەشکرێک هەبوو، ئەمڕۆش لە چیای علویا لەولای لازقی لەنزیک دەریای سپی تیڵێکی کورد هەیە بە ناوی زڕزار بەڵام موخابین ئەوان و دوو تیڵی کوردی دی زمانی خۆیان لەبیر چۆتەوه.

**زڕزڕە** (ڕەوا.): زوخاو، زلزلە، کێم، هەوا و ئاوی برینان. (ئەردە.) چتێکە منداڵان بە دەستیەوە دەگرن و زڕە زڕی پێدەکەن.

**زڕزۆپ** (ڕەوا.): بێشەرم، قسە لەڕوو. (باک.) گرفت. زڕزۆپی: گرفتی.

**زڕشەمشە**: گۆیەکی خڕی پڕپەرەدارە بەسەر گوڵینگەی ئاوریشمێدا دێتە خوارێ بە نۆبە لەسەر بسکان دەخرێ.

**زڕفەقێ**: نیوە خوێندەوار. کۆڵکە خوێندەوار.

**زڕقتک** (زا.): جوورە مێشێکی زەردە بەقەد هەنگێکی دەبێ.

**زرک** (هەورا.): کاڵەکی گچکە و زەردی نەگەیشتوو. (دزە.) سەتڵ، (هەو.) پەقرەج. (شا.، بابا.) تاڵکە، گڕکە، کاڵک. کاڵەکی نەگەیشتوو.

**زڕکا** (باک.): ئێلێکی کوردی گەورەیە لە باکووری شاری ئامەد(دیاربەکرێ) یە ماڵی سەیفەدین پاشا مەزنێ وان بوون پایەتەختی وان حەزرۆیە.

**زرکە**: زرک، خرچە، کاڵەکی نەگەیشتوو.

**زرکەتاڵە**: جوورە کاڵەکێکی زرکی تاڵە. زرکێکی تاڵە.

**زرکەڕچ** (باک.): زڕنچ.

**زرکتک** (باک.): زەرگەتە، زڕکێتک.

**زڕکچ**: کچی ژنێکییە لە مێردێکی دی و کچی مێردێکییە لە ژنێکی تری.

**زڕکۆ** (ئەردە.): گزرە، ئالیک، گیایەکە بۆ ئاژاڵان دابنرێ.

**زڕکوڕ**: هەنازا. (هەورا.) کۆڵەبەس. (باد.، بۆتا.) نەڤسی. کوڕی ژنە لە مێردێکی ترو هی مێردە لە ژنێکی دیکە.

**زڕکوزینگ** (ئەردە.): چوست و چالاک، قۆچاخ، تەڕدەست، زرنک.

**زرکوو** (ئەردە.): گزرە، ئالیک، ئاڵف.

**زرکێتک** (باد.): زەردەزیرە.

**زرگان**: زێیەکە لەڕۆژاوای دەرباسییەیە و کەوتۆتە خواررووی ماردینێ.

**زڕگەنە** (ڕەوا.، خۆ.): زڕەگەنە.

**زرگ و هەڵەت**: زوورگ و هەڵەت، (جا.) هەرد و هەڵەت. زەوی پڕ کەند و کۆسپە و بڵند ونەوی و سەروخووار.

**زرگوێز**: دارێکی گەورەیە وەکو دارە گوێزی وایە بەڵام ئەم گەڵای باریکتر و بێ بەریشە. ناوی دوو دێی خووار و ژوورە لە دەستەڕاستێکی ڕۆژاوای شاری سلێمانیەوە.

**زڕگیتە** (بار.): زەرگەتە.

**زرم** (ئەردە.): زرمە، گرم، ترپ. دەنگی کەوتنی چتە.

**زڕمام**: برای‌دایکی باوک.

**زرمە**: زرم و کوت، گرمە، ترپە. دەنگی کەوتنی چتێکە یا کەسێکە لە بڵنداییەوە و بەدەنگی پێ بە زەویدا دانیش دەڵێن. زڕە، زرینگە، دەنگی پووڵ و پارەیە.

**زرمەزرم**: زرم و کوت، زرمە لە دووای زرمە، دەنگەدەنگی کەوتنی مرۆ و چتمەکانە لە بڵندییەوە یا هی پێیانە لە شایی و زەماوەندێدا و ئیتر یا هی یەکسمانە.

**زرمەزلێ** (کە.): فشە، گاڵتەییێکی بێ شەرمانەیە، کە زۆر ئازاری یەکتری دەدەن و چتی پێکدادەن یا خۆ پێکدادان و زرمەزرم کردنی چەند کەسێک. (ئەردە.) زۆرانی، زۆرەوانی.

**زرمتانە** (کۆ.): تۆڵە. ـــ کردنەوە: تۆڵە کردنەوە. ـــ ئەستاندن: تۆڵە ئەستاندن.

**زڕمنداڵ**: نەوسی.

**زرم و کوت**: زرم و هۆڕ، زرمەزرم، تەپ و هۆڕ.

**زرمین** (باک.): زمین، زرمە، زرمەزرم، زمزم.

**زڕنا**: زوڕنا.

**زڕنازیق** (باک.): جۆلانە.

**زڕنە** (باک.): بڕوانە: زوڕنا.

**زڕنەبێژ** (باک.): زوڕنالێدەر، زڕنەڤان. ـــ ی: زڕنەڤانی، زوڕنا لێدان.

**زرنەڤان** (باک.): زوڕنالێدەر. ـــ ی: زوڕنا لێدان.

زڕنەبێژ

**زرنگ**: زیرەک، ئازا، ووریا، کوڕژ، پێسڤک، گورج، چاپوک، قۆچاخ، مەزبووت، دەس و بڕددار. ڕۆنی زەنگ، سادە و هیچ. تێکەڵنەبوو. بە دەس و برد.

**زرنگانەوە**: کزربوونەوەی چتی تەڕ. زرینگانەوە. دەنگدانەوەی دەفرێک لەکان دروستکرابێ. زڕانەوەی گووێ. ڕوونبوونەوەی چتی شل بە نیشتنی خڵتەی: ئاوەکە یا ڕۆنەکە زرنگاوەتەوە. درەنگ بەسەرهاتنی شەو: تاشەو نەزرینگێتەوە خەوی لێ ناکەوێ. ـــ ی دیزە و گۆزە و ئیتر. مەبەس لە باش سووربوونەوەیەتی.

**زرنگاندنەوە**: دەنگ لێهێنان لە زەنگوڵە یا گوێچکە.

**زرنگانن** (ئەردە.): زرینگاندنەوە، زڕانن (بۆ پارە و تار و چتی وا).

**زرنگە**: دەنگدانەوەی زێڕ و زیو و مسی زەردە و پارە لەکاتی وێککەوتنیان یا وەچتێکی ڕەق کەوتنیان، زڕە.

**زرنگەزرنگ**: زرنگەی یەک لە دووای یەکتری. درنگ درنگ.

**زرنگەی گوێچکە**: دەنگی گوێچکە.

**زرنگ و هۆڕ**: زرنگەزرنگی زۆر.

**زرنگی**: زرینگی. زیرەکی، گڕوفەن، ووریایی. (باک.) چەلەب. قۆچاخی، گورجی، گوربزە.

**زڕنووچقاو**: زڕنووقاو.

**زڕنووقاو**: زڕنووچقاو، چەورییەکی کەمە، کە دەکەوێتە سەرچێشتی شل.

**زڕنووقایی**: چەورییەکی زۆر کەمە بەسەر چێشتانەوە.

**زڕنیسک**: گیایەکە.

**زرو** (ئەردە.): زرب، دوشت، زبر، درشت.

**زرواڵێ** (هەورا.): زڕخوشک.

**زروە**: گیایەکی کوێستانییە گەڵای وەکو تەڕەبی وایە. (ئەردە.) درشتەی چت، کەپەک.

**زرۆنی** (هەورا.): ئەژنۆ، چۆک، دەستەو ـــ: دەستەو ئەژنۆ.

**زرۆی** (هەورا.): ئەسپۆن.

**زروو** (ئەردە.): زبری رووش، درشت. گیایەکی کوێستانیە گەڵای وەهی تەروو دەچێ.

**زروو پۆلیە** (هەو.): خشڵ، چەک، زرەپۆلیە، زروپۆلیە. ئەمەش بەندوباوی لەسەرە، مەشکەی خۆمان ناژێنێ مەشکەی خەڵکی دەژێنێ بە زرو پۆلیەیە.

**زرووزەنگیانە**: مت و مووروو.

**زرووقان**: سڵەمینەوە و ڕەوکردنی گیانداره لە ترسان.

**زرووقانەوە** (بل.): پێک پێکەنین، درێژەپێدان، پێکەنین بە حیلکەحیلک. جوولانەوە و دەنگ لێوەهاتنی چتی ساوا سا منداڵ یا بێچووی پەرەوورانبێ. پێکەنینی منداڵ.

**زرووکە**: دەنگی باڵندەی گچکەیە، جریوەی بێچووی چۆلەکەیە، جرووکە، جریوە.

**زرووکەزرووک**: زرووکەی یەک لەدووای یەکتری.

**زروهۆڕ**: زرەزڕی زۆر.

**زرویّ**: زروی.

**زروی** (هەورا.): ئەسپۆن.

**زرە** (باک.): زرێ.

**زرەهۆک** (باک.): گوڵینگ.

**زرێ**: زرە، سینگ زرە. کراسی ئاسنین، بەرگی ئاسنین لەپێشدا بۆ شەڕێ دەپۆشرا، کە لەمزریزەی ئاسن دروستدەکران شیر و خەنجەر نەیبڕێ. دەریا، زەریا، زریە، بێرم، بیرمە. تەبەقەی ئاسن بۆ پارێزگاری کەشتیان. زنجیر.

**زریاگ** (ئەردە.): زنیاگ. گۆپکەی کردوە (بۆ داروباران). گۆپکەدار. زرنگاو، زرنگیاگ. وازڕ، سڵەمیوەوە، ڕەویو، تەریو، نێچیری ترساو.

**زریان** (ئەردە.، خۆ.): کرێوە، بارینی بەفر و بارانی زۆر تووند و بەهێز. زرنگیان. کردنی دارانە لە بەهاراندا. (کۆ.) وورە. (شار.) شەرا. (بابا.) گرە. ڕەشەبا. بایەکە لەلای باکوورەوە دێ.

**زریان** (ئەردە.): زران، زرنگیان.

**زریانەوە** (ئەردە.): زڕانەوە، زرنگانەوە، زرنگانەوەی دەنگ.

**زریە**: زرێ، دەریا.

**زریەوان**: زریەدار، دەریاوان. ـــ ی: زریەداری، دەریاداری، دەریاوانی.

**زریەیی**: دەریایی.

**زرێبار**: دەریاچە، زرێوار، دەریاچەیەکە لە مەریوان و زۆر شووێنانی کوردسانێدا هەیە. کەناری دەریایان.

**زرێپەڕ**: زرێبار، کەناری زرێیان، قەراخ دەریا.

**زرێپۆش**: زرێدار، کەسێکە زرێی لەبەرکات.

**زرێپۆشی**: زرێ لەبەرکردن.

**زرێچ** (باک.): قوڕقوشم.

**زرێچە** (باک.): دەریاچە، بێرم، بیرمە.

**زریچ** (باک.): سیم، سوورمە، دەزووی زەرکەشە.

**زرێدار**: فرۆکە و کەشتی و ئۆتۆمبیلی جەنگی پۆڵایین. دەریادار، دەریاوان، زرێوان. زرێپۆش، (باک.) زرەکری.

**زرێدمی** (باک.): هەرزاڵ.

**زرێوار**: زرێبار، دەریاچە. تەپۆڵکە.

**زرێوان**: کەشتیوان، دەریاوان. ـــ ی: کەشتیوانی، دەریاوانی.

**زری** (باک.): دارێکە.

**زریچ**: قوڕقوشم، مز.

**زرشک**: دارێکی کورتە تێکوڵ و دارەکەی زەردن گوڵیشی زەرد دەنوێنی هێشووی هەیە میوەی گچکە و سوور و مزرە بۆ مرەبا و پلاوی باشە لە برشکیدا بەکاردەبرێ.

**زریزانە** (بابا.): دیوان، دولێرە، زیزانە، خولێرە، لەناو گەنمدا شین دەبێ دانەکەی وورد و تاڵە.

**زریزە** (کۆ.): هەودا باریکەکانی شینایی و مێوییە، سەرتوولە. زنجیری باریک و گچکەیە، ڕێزە.

**زریسک**: مۆرد، دڕکەزی، چاڵووک. (کە.) دارێکە زۆرتر لەداری زەیتوونێ دەچێ بەڵان ئەم دڕکاوییە.

**زریشک**: دارێکە بەرێکی خۆشدەگرێ و بەسەر پلاویدا دەکرێ، زرشک.

**زریکاندن**: چریکاندن، زیقاندن، زیکاندن، توند قیژاندن.

**زریکان**: زریکاندن.

**زریکە**: زیقە، زیرە، قیژە، شریخە، چریکە، زیکە، زیل، دەنگێکی باریک و تیژی گریانی ژن و منداڵانە، چریکەی گریان و هاواری منداڵ و ژنانە، دەنگێکی بەرز و تیژی گیاندارە. دەنگی جانەوەرانە. (جا.) نێوی دەردێکی کوتوپڕە.

**زریکەزریک**: چریکەچریک، زیقەزیق، زیکەزیک. زریکەی یەک لەدووای یەکتری، زریک و هۆڕ.

**زریکەکردن**: زریکاندن، زیقاندن، زیکاندن. تۆقین لەترسان. پلدان و چلدانی ئەندام بە ئازارەوە.

**زریکەلێهەستان**: زریکە لێ هەڵسانن.

**زریکە لێهەستاندن**: ئازار بە چەشنێک بە کەسێک گەیاندن، کە بزریکێنێ.

**زریکەلێهەڵسان**: چریکە لێوەهاتن.

**زریکەلێهەڵساندن**: وەزریکەخستن.

**زریک و هۆڕ**: زایەڵە، شیوەن.

**زرین** (باک.): زەرینی کەر و ئێستر.

**زرینچک**: زرینچکاو.

**زرینچکاو**: زرینچک. ئاوێکی زەردە لە برینان و لە مەشکەی دۆ و توورەکەی تۆراخیەوە دێتەدەر و دەتکێ.

**زرینگ**: زیرەک، زرنگ، ووریا، چەسپان، بلیمەت، ووشیار، ووتوو ووریا، هۆشیار، هۆشمەند.

**زرینگان**: زرنگان.

**زرینگانەوە**: زرنگانەوە، (باک.) زرنگین. ـــ ی گووێ: دەنگ لە گووێچکەوە هاتن. ـــ ی مس: دەنگ لێوەهاتن. ـــ ی دیزە و گۆزە: باش سوور بوونەوەیەتی.

**زرینگاندنەوە**: ساغکردنەوە.

**زرینگە:** زرنگە. نێوی دەنگە، جنگە، پاب، (باک.) پاپ. ـــی پارە و پوولـی سپی: دەنگی دراو زڕەی پـارە. ـــ لێهـاتن: چرنگـین. ـــی زنجیری: زڕەی زنجیری. دەنگی مس و زەنگوڵە و ئیتر.

**زرینگەزرینگ:** جنگەجنگ.

**زرینگی:** زیرەکی.

**زریوە:** نێوی دەنگی پەڕەووری چکۆڵـە و سیسرکێیە. جریـوە. وورشـە و پرشەی چت، (ئەردە.) ووریشە. (ئەردە.) وورژشیان.

**زریوەزریو:** جریوەجریو، زریوەی یـەک لـەدووای یـەکتری. وورشەوورشـە، وورشەووریش، وورژشەوورژش.

**زسان:** زستان.

**زستان:** (ئەردە.) زسان. (فە.، دەر.) زمسان، زمستان. (کـە.) جستان. (باک.) زڤستان. سێ مانگەکانی نێوانی پاییز و بەهارێیە.

**زستانە:** زستانی.

**زستانەوار:** قشلاخ، قۆناخی زستانێ. زستانە هەوار.

**زستانەیی:** زستانی.

**زستانی:** چتێکە، کە هەر لە زستاناندا بەکار بهێنرێ.

**زشت:** ناحەز، ناشیرین، خراو، زرب، ناکوڵوکـار. ـــە: دوشـتە، زربـە، خراوە، قسەی ڕەق. ـــی: ناحەزی.

**زعەف** (ئەردە.): لـەسەرخۆچوون، لە خۆچوون، بوورانەوە، بێهۆشبوون.

**زغاڵ** (لو.): خەڵووز، زوخاڵ.

**زغالدان:** خەڵووزدان.

**زغرک** (زا.): ووردەبەرد.

**زفت:** (باک.) قاقب. قیری خۆشکراو. (هەورا.) زەوت. ڕەنگیشی بۆرە.

**زفیر** (باک.): دوودەی چڕ.

**زفار** (باد.): پارچەی چت.

**زقاف:** گاسنێکە، کە دەستی لـێ هەڵبڕابێ بۆ ئەوەی، کە زۆر بچەقێ.

**زقر** (باک.، باد.، زا.): زوور، زبر، گر، دڕ.

**زقران** (شکا.، باک.، باد.): سـووڕدان، گەڕانـەوە، سووڕانەوە. بـادرانی تەشی و سووڕاندنی هەر چتێکی بێ، خولخواردن.

**زقراندن** (باد.): گەڕاندنەوە، ناردنەوە. بزڤرینە: بگەڕێنەوە.

**زقرک** (باک.): ژەنگـە سوورە، شـەنگە سوورە. (باد.) گێژەنـەی ئـاو، خولخواردنی ئاو.

**زقرۆک** (باد): گێژەنەی ئاو، خولخواردنی ئاو.

**زقرین** (باک.): گەڕانەوە. (زا.، باد.) سووڕانەوە.

**زقستان** (باک.): زستان. ـــی: زستانی.

**زقنگ** (باک.): ئەشکەوتێکە تێیدا دادەنیشن، ڕابووارگەی زستانێیە بـۆ خاوەند مەڕان.

**زقیرک** (باد.): مێشێکە لە خیز و خۆڵی وورد دا قووڕتان دەکات.

**زق** (باک.): زەق، مـۆڕ، چـەقـــ کرن: چـاو لـێ زەقکردنـەوە. (کـە.) زەق، دەرپەڕیو، بەرزەوەبوو، لـەسنوور دەرچوو. (ئەردە.) زوهۆر، ئاوەزێ، زنەک.

**زقاق** (باک.): دالآن.

**زقا:** زەق.

**زقایی** (کە.): زەقایی.

**زقزق** (باک.): دەنگی خڕەکێیە، دەنگی لێک خشانی دووچتانە. زیق زیق.

**زقووم:** زوقم، خووس.

**زقی** (باک.): زەقی.

**زک** (باک.): سک، زگ، ئوور، هوور. ناوزگ، ناو، تووێ. بار، منداڵ، مناڵ، پس. (باک.) میچ. ـــێ خێنی: میچی خانوو.

**زکاک** (باد.): پاک، خاوێن.

**زکەدڕێ:** خۆکوژتن، ورگ دڕاندن.

**زکە دەردە:** زگئێشە.

**زکەڕۆ:** زگەڕۆ.

**زکەشۆرە:** زگەشۆرە.

**زکەشۆرەپێکەوتن:** مەبەس لە ماندووبوونی کەسێکییە، کە زۆر هـاتو چۆی کردبێ.

**زکەشۆرێ:** زگچوون.

**زکەمەسێ:** ئاوبەند.

**زکبەردان:** مەبەس لە زۆر خواردنە.

**زک ئێشە:** زگێشە.

**زکپڕ:** زگپڕ، ئاووس. ـــ بوون: ئاووسبوون. ـــ کردن: ئاووسکردن.

**زکچوواندن:** ڕەونکردن. سەرپێیی پێ کردن.

**زکچوون:** ڕەوانبوون، سەرپێیی کردن.

**زکدار:** زگپڕ، ئاووس، تۆڵدار. ـــی: تۆڵداری.

**زکدەرپەڕیگ:** وورگن.

**زکدڕاو:** مەبەس لە گیانداری زۆر خۆرە. ـــی: زۆرخۆری.

**زکڕەش** (باک.): ناپاک، قین ئەستوور، دڵپیس. ـــی: ناپاکی، قین ئەستووری، دڵپیسی.

**زکرۆیاندن:** زگچوواندن.

**زکرۆیین:** زگچوون.

**زکزل:** زگدڕاو، زۆرخۆر. ـــی: زگدڕاوی، زۆرخۆری.

**زک کردن:** ئاووسبوونی مێیینە و زانی.

**زک لەوەڕاندن:** مەبەس لەیەکێکییە، کە بەخۆڕایی لێرە و لەوێ بخووات و خۆی بژێنێ.

**زک لەوەڕێن:** کەسێکە بە خۆڕایی خۆی بژێنێ.

**زکماک:** دەرد یا نیشانێکە، کە لەزگی دایکەوە گیاندار پێیەوە بووبێت. ـــی: زگماکی.

**زکماکی:** زگماکی.

**زکن** (کە.): وورگن، زگن، ئەوسن.

**زک و زا:** سک و زا، زگ و زا.

**زکوونی** (زا.): نەوسن، چڵێس.

**زکێش** (باک.): زگئێشە.

**زکێشە:** زگئێشە.

**زکیکی** (باک.): لەخزینێدا دەخوشێنێ.

**زگ:** (باک.) نۆچک، ئوور. (سوور.) تل (کە پڕ بێ). (باد.) تەل(کە پڕ بێ). (بابا.) سک. (باک.) بەڕان، وورگ. (هەو.) لەمە، لەمە. تۆل، تۆلە. زک. بە ـــ: زگپڕ، تۆلپڕ، تۆلدار. ـــ ی پڕ: تل. ـــ ی دانا: واتە ژنەکە زا. چتێکی هولۆڵە لەپێشەوەی لەشی مرۆ وورگ و ریخۆڵە و کەل و پەلی دیکەی تێدایە. خەریکی، پێگرتی. لە ـــ ە: خەریکە. لە ـــ بوون: خەریک بوون. وێزە، گیان. هاتە ـــ ی: هاتە وێزەی. بەزەیی. ـــ پێسووتان: بەزەیی پێداهاتن.

**زگار** (لو.): هەڕەوەزکردنە بۆ تووتن شکاندنەوە یا چنینەوەی میوە لەژێر دارەکەیدا یا تووتن چاندن و پەمۆ و ئیتر.

**زگاو** (هەو.): تێراو، بۆ خاک و شیناوەردی.

**زگ ئێشە:** سک ئێشە، زک ئێشە.

**زگەدەردە:** زگئێشە.

**زگەڕۆ:** چاوبرسی، نەوسن، سکەڕۆ، کەسێکە زۆر وەدووی تێرکردنی زگی بکەوێ.

**زگەستوور:** وورگن، (گێژ.) زگدەنە.

**زگەشۆرە:** زگچوون، ڕەوانی، سکەشۆرە.

**زگەشۆرە پێکەوتن:** زگچوون.

**زگەشۆرێ:** سکەشۆرێ.

**زگەمەسی** (بابا.): ئاوبەند، ئیسقایی.

**زگبرسی:** زاخۆران، زۆرخۆر.

**زگبرسێتی:** سکبرسێتی، چاوبرسێتی.

**زگ پەرست:** چڵ، نەوسن. ـــ ی: چڵی، نەوسنی.

**زگپڕ:** تۆلدار، ئاووس، تلدار، بەزگ، تۆپڕ، سکپڕ. بەردار. ـــ بوون: ئاووسبوون، تۆلداربوون، بەرداربوون. دڵپڕبوون، ڕقداری. ـــ کردن: ئاووسکردن. ـــ ی: تۆلداری، تۆپڕی، ئاووسی، زگداری.

**زگپێسووتان:** بەزەیی پێداهاتن.

**زگچوواندن:** ڕەوانکردن.

**زگچوون:** زۆر چوونە سەرپێیان، زۆر سەرپێیی کردن، ڕەوانی، زگەشۆرە، سک ڕژین، سکچوون. زگڕژین.

**زگدەرپەڕیک:** زگهاتک، گدگن، وورگن.

**زگدەنە** (گێژ.): زگەستوور، زگن، وورگن.

**زگدڕاو:** زکدڕاو، زۆرخۆر. ـــ ی: زکدڕاوی، نەوسنی.

**زگدڕین:** زگهەڵدڕین.

**زگڕەش:** دڵپیس، بەدنیهاد. ـــ ی: دڵپیسی، بەدنیهادی.

**زگڕژیاندن:** زگچوواندن.

**زگڕژین:** زگچوون.

**زگزل:** وورگن، (هەورا.) بەرزگ. سکزل، زگدەرپەڕیک. ـــ ی: سکزلی.

**زگسووتان:** بۆ دایک و باوکێک بەکاردەبرێ، کە منداڵ و ڕۆڵەی شیرینی بمرێ. جەرگ سووتان، سکسووتان.

**زگسووتاندن:** منداڵی دایک و باوکێکی کوشتن. هەتک پێکردن، زیانێکی قورس پێگەیاندن.

**زگسووتاو:** جەرگبڕاو، کەسێکە ڕۆڵە و منداڵی مردبێ و لەناوچووبێ.

**زگسووتاوی:** باری مردنی منداڵی دایک و باوکە.

**زگفراوان:** بەپشوو، پشوودرێژ، بێندرێژ. ـــ ی: پشوودرێژی.

**زگکەر:** بە زاوزێ، زەوزێک، زاوزێکەر، زگوزاکەر.

**زگ کردن:** ئاووس بوون، زاوزێکردن.

**زگ لەوەڕاندن:** چڵێسی، نەوسنی.

**زگ لەوەڕێن:** چڵێس، نەوسن.

**زگماک:** خۆڕسک، لەبنەوە، لەڕیشەوە. کەم و کووڕی یا دەردێکی لەشە لەکاتی لەدایک بوونێوە بووبێتی، جگمە بۆ منداڵ و هەموو گیانلەبەرێکییە. زکماک، سکماک، زکماه. زمانی ـــ ی: زمانی دایک و باووک. ـــ ی: خۆڕسکی، خیرۆکی، زکماهی.

**زگن:** وورگن، زکن.

**زگورد** (باک.): سەڵت، تەنها، بێ هاواڵ، بێ کەس، بێ ماڵ و منداڵ.

**زگوزا:** زاوزووە.

**زگ و زاکەر:** ژنێکە زگان بکات، زگکەر.

**زگ و ماک** (هەورا.): دایک و بێچوو.

**زگێشە:** زگ ئێشە، (هەورا.) لەم ئێشە. برک، ژان، دڵێشە، دڵەدەرد، دڵئێشە، زکەدەردە.

**زل:** زەلام، گڵێن. گەورە، مەزن، گر، زنک، گرا، زەبەڵاح، زۆر گەورە. زلە. (دزە.، باک.) زەل، چڵ (تەنها بۆگیا و پنچک دەبێ). پەڵووپۆی گیای هەڵوەریو. درووداڵ. (باک.) قامیش. ـــ دان: چاو پێ هەڵنەهاتن. (باک.) هان، ڕقداری. ـــ کردن: هاندان، ڕقدارکردن. قەڵەو، لەندەهۆر.

**زلام** (باک.): زەلام. ـــ ی: زەلامی.

**زلان:** ڕەشەبا، زریان.

**زلایەتی** (کە.): گەورەیێتی، زەلامی.

**زلە** (باک.): زللە، شەقەزللە، شەپەلاخە. زل، گەورە.

**زڵە:** زڵەزڵ. دەنگەدەنگی چەند کەسێکییە بە کۆمەڵە. خوڵوو، هەرا، هۆریا، کەپوورە.

**زڵەدەرد** (هەورا.): دڵەدەرد.

**زڵەزڵ:** زڵە. تڵەتڵ، سووربوونەوە لە ئاووردا.

**زڵەقیاگ** (ئەردە.): زلقیاگ.

**زڵەقیان** (ئەردە.): شڵەقانی قوڕوقوڕاو و چتی تر.

**زلبوون:** بەرزبوونەوە و ئەستووربوونی گیاندار و درەخت و سەوزایی. مەبەس لە گەورەبوون و بەرزبوونەوەی کەسێکییە.

**زڵت:** زرت و پرت.

**زڵچە:** دەنگێکە لەکاتی شێلانی هەویردا پەیدا دەبێ، کە ئاو یا ڕۆنی زۆر بێ یا بەناو بەفری تەڕ و قوڕوچڵپاودا بڕۆی ـــ ی دێ.

**زڵچەزڵچ:** زڵچەی یەک لە دووای یەکتری.

**زلحۆ:** زلحۆرت.

**زلحۆرت:** زلحۆل، زەبەللاح، لەندەهۆر، زرتەبۆز.

**زلحۆل:** گێل، گەوج. ــ ی: گێلی، گەوجی.

**زلحیز:** کەسێکە بە قەڵافەت زەلامبێ و بەڵان لە کارکردنێدا سست و تەمپ و حیزبێ. ــ ی: زەلامی و تەنبەڵی.

**زلزلە:** زلە، هەراوهوریا، هەنگامە. (هەورا.، شار.) هەوا، زووخاو، ئاوی روونی زیپکانە، کە هەوا و خوێنی تێدا نەبێ. کێم. ناوی دێیەکیە لە هەرێمی سرووچک.

**زلف:** زولف.

**زلف:** گیس، قژ، ئەگریجە، گێسو، پەرچەم. ئەو بەشە تووکەی ئافرەتانە، کە بەسەر نێوچاوانیدا شۆڕبێتەوە.

**زلف پێچدریاگ:** زلف لوول.

**زلفچی** (باد.): فەریکە پەنیری کولاوە، پەنیرێکە دووای کولانی ئاوی لێچووبێ.

**زلفگیر:** چتێکە لە زولفدەدرێ تا تێک نەچێ.

**زلفلوول:** زلف پێچدریاگ.

**زلفنج:** قوزەلقورت، سندان. (روو.) کندرووس. بۆ جنێو بەکاردەبرێ. گیایەکی زۆر تاڵی بەهارییە گەڵایەکانی وەکو کەرەووزین. بەهارێ دراوی بە برینی کرماوی تازاڵاندا دەکرێ.

**زلفنجاو:** ناوی قوزەلقورت و سندانێ.

**زلفنجکردن:** لە رووی سووکییەوە دەگوترێ بە یەکێک لە جیاتی قوزەلقورت.

**زلق:** سلق، گیایەکی گەڵاپانە بۆ دۆلمە و چێشتی تر بەکاردەبرێ. (کە.) تەکان. ــ دانەخۆ: تەکاندانەخۆ بۆ هەستان و رۆیشتن و چتی تر.

**زلقاو:** قوڕاو، چلپاو، قوڕوچلپاو. سلقاو.

**زلقەزلق** (موک.): قوڵتەقوڵتی ئاو و چێشتی شلەیە لەکاتی کولانیدا.

**زلقیاگ:** زنەک، قوڕاو، چلکاو، چلپاو. (ئەردە.) قوڕاوی شلەقاو، شێراو، شلوقیاگ.

**زلقیان:** قوڕاوی بوون.

**زلک** (فە.): دەنکە شەمچە. (باک.) زل، زەلام. (بابا.) جوورە ترێیەکە.

**زلکە:** ناوی جوورە ترێیەکە.

**زلکوێر:** کەسێکە بە گەورەیی کوێر بووبێ. چاوشلەقاو. ــ ی: بەگەورەیی کوێربوون.

**زلکێنە** (گەر.): زەرگەتە.

**زللە:** چەپازلە، شەقەزللە، زەلە، شەقام، شەقل، سەترە، شەلپ، (خۆ.) شەق. ــ لێدان: شەقامدان، زەلەدان، چەرپاندن، بەبەری دەست لە بناگوێی کەسێکی دان.

**زللەی پشتمل:** دۆق، پژملە.

**زلندار** (باک.): گیایەکی تاڵە.

**زلۆبێ:** ناوساجی.

**زلوبیا:** جوورە شیرنیاتێکی وەکو پەنجەرەی کونکونە و ئیە لە هەویر دروستدەکرێ و شیلەی شەکری بەسەردا دەکرێ.

**زلووک** (زا.): دەنک. ــ ە شەمچەیەک: دەنکە شقارتەیەک.

**زلووکە** (زا.): شەمچە، شخارتە، شقارتە.

**زلەمین** (باک.): رەنگ زەرد هەڵگەڕان. بزلەمە.

**زلی:** گۆشتنی، فیلەتەنی. زەلامی، گەورەیی، مەزنی، گری.

**زلی بێخێر:** زلحیز، زەلامێکە تەمپ و بێ سوود بێ.

**زلینە** (رەوا.): قەرتاڵە، سەوەتەیێکە لە زەل یا قسەل یا پووش دروستکرابێ.

**زلیندک** (باک.): دووارد، مەقەست.

**زم** (باک.): زرمە، زمزم.

**زماک** (زا.): شوورێنی نزم لەنێو شاخاندا، کە هەتاو نەیگرێ.

**زمان:** زبان، ئەزمان، زموون، (فە.) زۆ، زوبان، هەزمان، (کە.) زووان. پارچە گۆشتێکی درێژووکەیە لە زار و تامی چتی پێدەچێژرێ و پارووی پێ ئەودیو ئەودیو دەکرێ، زار بەیاریکاری زمانەوە قسەی پێدەکرێ. بە ــ : بەدەم، بەدەم و پل، (باک.) بزمان. ــ ی کوردی: زبانی کوردی. بێ ــ: لاڵ. چوونە ژێر ــ: قسەلێدزین.

**زمانە:** پروانە: زبانە.

**زمانە پەنجەرە:** پارچەداریا ئاسنێکە، کە پەنجەرە پێوەدرا دەیسوورێنێتەوە سەر پەنجەرەکەی تا نەکرێتەوە.

**زمانە بچکۆلە:** زمانەچکۆلە.

**زمانەچکۆلە:** زمانە بچکۆلە، (رۆژ.) بەرگە. پارچە گۆشتێکە بە مەلاشووەوە نووساوە بەدەم گەرووەوە.

**زمانەگا** (موک.): گاوزمان، گوڵزووانە. گیایەکە گوڵەکەی بە ئاوەوە بکوڵێنرێ و سبەینان لە خورێنی بخورێتەوە بۆ دڵەکوتێ باشە، ئەوانەی نەخۆشی دڵیان هەیە سوودیان لێدیتەوە.

**زمانە گولانە** (هەورا.): زمانەچکۆلە.

**زمانەی هەوجارێ:** زمانی دەندە، زووانە.

**زمان بەد:** بەدبێژ، بەدگۆ، زبانبەد. ــ ی: بەدبێژی، بەدگۆیی، زبان بەدی.

**زمان پاراو** (هەورا.): زمانلووس. ــ ی: زمانلووسی.

**زمان پاک:** زبان پاک، زمان خاوێن، کەسێکە لەبارەی مەردوماندا هەرباش بدوێ. ــ ی: باش دووان لەبارەی مەردوماندا، زبان پاکی.

**زمان پژاندن:** زمانکردنەوە، سەرەتای ووشە فێربوونی منداڵانە.

**زمان پژاو:** زمانکراوەوە.

**زمان پیس:** (باک.) ئەزمانرەش، پیسدووێن، بەدگۆ، زبان پیس. ــ ی: پیسدووان، بەدگۆیی، زبان پیسی.

**زمانتاڵ:** قسەرەق، زبانتاڵ. ــ ی: قسەرەقی.

**زماندار:** مرۆی بەدەم، بەدەم و پل. ــ ی: بەدەم و پلی، بەدەمی.

**زماندان:** پەیمان و بە لێنیدان.

**زماندرێژ:** (باک.) کەسێکە لە ئەندازەی خۆی پتر و بەرەو ژوورتر لە بارەی مەردوم بدوێ. دڕ، بێ شەرم، چەنەسووک، بێ ئابڕوو، سوواو، زباندرێژ. ــ ی: زباندرێژی. دڕی، بێ شەرمی، چەنەسووکی.

**زماندن:** بەرەلاکردن.

**زمان ڕەق:** قسەڕەق.

**زمانزان:** زبانزان، زووانزان، شارەزای زمان، ئەزمانزان، کەسێکە شارەزای چەند زمانێکی بێ. ــ ی: زووانزانی، شارەزایی زمان.

**زمانشڕ:** زماندرێژ، دەمشڕ. ــ ی: گەزارە، زماندرێژی.

**زمانشکان:** لە دوروان کەوتنی کەسێکی بەهۆی نەخۆشی یا ترسەوە، زبانشکان.

**زمانشکاندن:** لە دووان خستنی کەسێک بە هۆی نەخۆشی یا ترسەوە.

**زمانشیرین:** زبانشیرین، ڕووخۆش. ــ ی: زبانشیرینی، ڕووخۆشی.

**زمانکێشان:** زماندرێژیکردن، بێ شەرمی کردن. جنێودان. ــ ی مالات و وولاخ لە گەرمان یا لەبەر ماندوێتی: زمان دەرهێنان. بۆ مەبەسی ماندوێتی و تینوێتیش بەکاردەبرێ.

**زمانگەزتن:** مەبەس لە پەشیمان بوونەوەیە و بە پەرۆش بوون لەبەر لە دەستچوونی چتێکی.

**زمانگرتن:** کەوتنە ئاخۆتنی منداڵی ساوایە. بێ شەرم و بێ پەروایانە ئاخۆتن، زبانگرتن.

**زمانگیران:** زبانگیران بە هۆی لاڵییەوە، پسکی.

**زمانلووس:** چاپلووس، چاپلووسیکار، کلکەسووتەکار، پیراموس، زمانلووس، کەسێکە بە زمانی لووس مرۆی تەفرە بدات. ــ ی: چاپلووسی، پیرامووسی، کلکەسووتەکاری.

**زمانۆک** (باک.): بۆڕی پشوو، قرقرتۆک.

**زمانۆکی قۆدێ:** زمانی قفلی.

**زمە** (زەن.): شیشەی تفەنگێ. لوولە ئاسنێکی کونداره، دەم تیژە چەرمی پێ کون دەکرێ بۆ تیهەڵکێشانی چاخمە.

**زمپارە:** قاقەزی پەرداخ، سمپارە.

**زمڕان:** تاقی کرانەوە.

زمڕاندن (هەو.): تاقی کردنەوە، زانین، ناسین.

**زمڕاو** (هەو.): تاقی کراوەوە، زانراو، ناسراو.

**زمڕق:** چزووی دووپشک و یا زەرگەتە و ژەنگەسوورەیە.

**زمڕووت:** جوورە بەردێکی نرخدارە لە قاشی ئەنگوستیلە و چەند جوورە خشلێکی دەگرن.

**زمزم** (باک.): زرمەزرم، زرمە.

**زمزمۆک** (ڕەوا.، بار.، خۆ.): ووزووزە، (خۆ.، کۆ.) قازی بازی. جوورە قالۆچەیێکی باڵدار و سەوزە، کە هەستا ووزەووزێ دەکات.

**زمسان** (هەورا.): زستان. ــ ە: زستانە. ــ ی: زستانی.

**زمستان** (دەر.، جەبا.، فە.): زستان، زمسان. ــ ی: زستانی.

**زموون** (فە.): زمان.

**زمهاڕ** (ئەردە.): ئاردێکە، کە بۆ زستان هەڵدەگیرێ، زەمهەڕ، زەوەڕ، ئارد هاڕین بۆ زستان. زەم ئاس.

**زمهەڕ:** زەمهەڕ.

**زمهێڕ** (خۆ.): بەڕوو و دەغڵ و دانی درشتی هاڕراوە بۆ مەڕ و مالاتان.

**زمی** (خۆ.): تاقی کراوەوە، ئازموو، بیزمە: تاقی کەوە. ئەزمم: تاقی دەکەمەوە.

**زمین** (باک.): زرمین، زرمە لێهاتن، زرمەزرم کردن. (ئەردە.) تاقی کردنەوە.

**زن** (زا.): ژن.

**زنار** (باک.): نسار، نزار، لای باکووری چیایان. (زێ.، باد.) سەخت، جێگای دژوار و حاستەم، (زا.) زنێر. بەردی گەورە، (باد.) ماهی زەرد. (زێ.، باد.) پارچە چیایەکە، کە هەمووی بەردبێ و ڕێگای ئاسانی نەبێ، (موک.) ماه. وەکوو: زنارا کیستە: ناوی گوندێکی بەرزە لەسەر شاخێکی بڵند و سەخت.

**زناریشک:** گیایەکە گەڵایەکانی بەقەدەر بەری دەست پانن و بێ بۆن و بێ گوڵە مالات دەیخوات.

**زنازنا** (ئەردە.): زوکم زوکم، کەپوورە، هەراهەرا، دادوبێداد.

**زنان** (کە.): سندانی ئاسنگەران. زننان، زیندان.

**زناو** (ئەردە.): زەهاو، زنەک. پارچە زەوییەکە هەمیشە ئاوی تێدا ڕادەوەستێ و لێی دەزێتەوە. (باک.) پەهناف، چراف، (هەورا.) زنکاو، زەنەک، (جا.) زۆنگاو، زۆنکاو، (جا.، بابا.) زەلکاو. ئاوگیر، لیتە، قۆپیە، باتلاخ، ئاوگر، ئاوزا. (دەر.) دەقن. تەرازن. زەهاو.

**زنە** (کە.): زیندوو، زینک، زیننە.

**زنەیی** (کە.): ژیان، زیندوویی.

**زنتۆت:** بە مەردووم پێکەنین.

**زنج:** دوو تاسە لە شایلۆغاندا لێکدەدرێن زرنگەی خۆشە. کۆخ، قۆخ، (جا.) دۆنگز. (زەن.، جەبا.) تەپڵەک. زنجی مەڕانە لە زەل و قامیش دروست دەکرێت. ــ داکوتان: ڕیشەداکوتان، دامەزران. (زەن.، داو.) هەڵپەڕکێ، ــ کردن: هەڵپەڕین. چاڵی چەنەگە. تەویلەی دەوارانە لە قامیش و پووش و پەلاش دروستدەکرێ. (فە.، هەو.، جا.، کەل.، باک.، کە.) چەنە، چەنەگە، چانە. ساباتێکە عەرەبانە و چتی تری لەژێردا ڕادەوەستێ. تیژ(بۆ تیغ).

**زنجار** (بالە.): ژەنگ.

**زنجاف** (لو.): پەراوێزی کەوا.

**زەنجەفیل:** ڕەگی گیایەکی پەلک درێژە زۆر توندو تیژە بۆ چێشت و لە پزیشکیشدا بەکاردەبرێت.

**زنجە گیا** (هەورا.): قۆریە.

**زنجیر:** (باک.) جۆل، شاران. زەنجیر. زریزەی ئەستووری ئاسنین.

**زنجیرە:** زەنجیرە، هەڵبەستنی لێواری شەدە و ئاغەبانوو و بەرماڵ و چەفتە و هەندێ چتی دی بە ئاوریشم یا بە دەزوو. کولۆشی گەنم و جۆیە، کە لە خەرماندا بەڕێزە دابنرێ، ناوەکەی پڕبکرێتەوە لە کلۆش. چەند چتێکە لە تەنیشت یەکتریەوە بە قەتارە وەستابن. بڕگەی قەراخ و کەناری چتان.

**زنجیرە بەستن:** وێستانی چەند چتێکی زۆر بەگردی لە تەنیشت یەکترییەوە.

**زنجیرەدار:** چتێکە، کە زنجیرەی هەبێ وەکو پارەی (٥٠) فلسی.

**زنجیرەدان:** زنجیرەبەستن.

**زنجیرەوکووا** (هەورا.): زنجیرەی کێوان.

**زنجیرەی ئاو:** وەکوو زنجیرەی نوواندنی ئاو.

**زنجیرەی زێر:** چارب.

**زنجیرەی قەراغ نەخشکاری:** زنجیرەی کەناری نەخشکاری.

**زنجیرەی کۆ** (فە.): زنجیرەی کێوان.

**زنجیرەی کێوان:** کێو، ملەکێو، سەفان.

**زنجیربەند:** زەنجیربەند.

**زنچ** (هەورا.، کە.): چەنەگە.

**زنچک:** شەمۆز، مالاّت و وولاّخی شەمووس. (یەز.) خەرپشتە.

**زنچکاو:** ئاوی بریان، ئاوی پیس. زرینچکاو.

**زنخ** (باد.): بۆنی ناخۆش. (باک.) بێ نرخ، نزم، پەست.

**زنخدان** (کەل.): چەنەگە. بەرخەبەبە.

**زندان** (هەو.): سندانی ئاسنگەران. (باک.) زیندان.

زندان

**زندی** (خۆ.): ئەسپێ و کێچ.

**زنزان:** زندان، زیندانە. گرتووخانەی یەک کەسی و تەنها جێگای تاکە کەسێکی تێدا دەبێتەوە.

**زنگ** (باک.): دەنگی ئاسن و زەنگی. زەنگ.

**زنگاو** (هەورا.): زناو، زنەک.

**زنگار** (باک.): ژەنگ، زنجار. ـــ ی (باک.): زەردی ڕەنگ تەلّخ.

**زنگازنگ** (زا.): دەنگی زەنگ.

**زنگرین** (زا.): تۆپینی سەگ.

**زەنگل** (زا.): زەنگولّە.

**زنگین** (باک.): چنگین، چرنگین. زرنگەی ئاسن و کانان و زرنگانەوەی گوێ.

**زننان:** زنان، زیندان، زنیان.

**زنوو** (کە.): زیندوو.

**زنێر** (زا.، باد.) زنار. جێگای دژوار و سەخت و تووش لە چیایاندا، ماهی زەرد.

**زنیاگ:** زریان، پشکووتن، گۆپکەکردە.

**زنیر** (هەر.): بڕوانە: زنێر.

**زۆ** (فە.): زمان. گیایەکی بەهاری و کوویستانی بۆنخۆشە و گەلاّی وەکو هی چنوور وایە و دەخورێ. (باک.) جووت: دوو زۆت، دووجووت.

**زۆپ** (باد.، شکا.، جەبا.): کلاّوی درێژی لەباد.

**زۆپا:** سۆپا، کوورە، زۆپە.

**زۆپە** (کە.): کوورە. زۆپا.

**زۆتا:** گیایەکی بەهارییە گەلاّیەکانی وەکو گەلاّی ڕێحانەیە، گولێکی شین دەگرێ.

**زۆتک** (زا.): لێواری کونی قوون. بۆ تووڕە و قەلّسکردنێ دەلّێن زۆتۆ، زۆتێ.

**زۆخ** (جا.): زرزرە، زوخاو، زووخ. هەوا و کێمی بڕینان.

**زۆر:** گەلێک، فرە، پڕ، زەوەند، قەوی، زەعەف، بۆش، گوژمە، زەحەف، سات، گەلێ، زەهەف، زووربە، گەلەک. ستەم، جەور، بێدادی، خورتی، بێگار، زەبر، جەوور. بە ـــ ی: بێگاڤی، بەکەلّەزەڕی، بەخورتی. هێز، تین، توانایی، چاڤسۆری، پێ ستووری، گیر. نوودلاّنە، زۆربگیر. بتەوێ و نەتەوێ، دلّنەخووازانە. ڕفانن، ڕفاندن، کێشەر. فرە، گەلێ، گەلێک، (ئەردە.) مشەمەر.

**زۆراب:** نێوی نێرینانە.

**زۆراستاندن** (باک.): زۆری لێ ئەستاندن.

**زۆراڤا:** زۆراوا، بە زۆر ئاوەدانکراو. ناوی گوندێکییە لە ڕۆژاوای نوسەیبینێ.

**زۆران** (بابا.، گەر.، ئەردە.): زۆرەوانی، زۆرەبانی.

**زۆرانەوە** (ڕەوا.، سوور.): جوولاّنەوە، سووڕانەوە، گەڕان، گەڕانەوە.

**زۆرانباز:** کەسێکە زۆرانی بگری و لەو پیشەیەدا پسپۆربێ. ـــ ی (خۆ.): زۆرەوانی، زۆرانی گرتن.

**زۆراندن** (هەر.): زەڕەی کەر و ئێستر، شەهاندن.

**زۆراندنەوە** (ڕەوا.، سوور.): جوولاّندنەوە، سووڕاندنەوە، گەڕاندنەوە.

**زۆرانگرتن:** زۆرانی گرتن، زۆرەوانی گرتن.

**زۆرانی:** (زەن.) حیز. (باد.) تێڕووچانک.

**زۆرانی گرتن:** زۆرەوانی گرتن.

**زۆرە:** ئەستێرەی زوهرە، ناهید.

**زۆرەبانی:** زۆرەوانی.

**زۆرەزمێ:** زرمەزلێ، زەرمەزلێ، زۆرەوانی.

**زۆرەزۆر:** بە ـــ گریان.

**زۆرەکی:** زۆربگیری، زۆرملی، نەوەدلاّنە. (ئەردە.) بێگاری.

**زۆرەملە:** زۆرە ملێ.

**زۆرەملێ:** زۆرەملە، زۆرلێکردن، زۆرەکی، زۆربگیر.

**زۆرەوانی:** زۆرانی، زۆرانێ، بنکەفشانێ، عەردانێ، (باد.) خۆلێکدانێ، (گەلاّلە) تێکوەرانێ، (کە.) زۆران، (خۆ.، سوور.) حاردانە، حاردان. (خۆ.) زۆرانبازی، تێکوەرانە، (سوور.، ڕەوا.) تۆکەرانێ، (باک.) پەرە چۆنک، پچەنگانێ، بناڤێ، (هەورا.) پەرەچونگ، زۆرەبانی، (ئەردە.) زرمەزلێ. ـــ گرتن: مل لەبەرملی یەکترینان، زۆرانی گرتن.

زۆرەوانی

**زۆر بگر:** کارێکی بەبێگارو بەزۆر بە یەکێکی کردن.

**زۆربایی:** زۆرەکی، زۆرەملێ، دلّنەخووزانە.

**زۆربگیری:** بێگاری، زۆربایی، زۆرەکی.

**زۆربلّێ:** چەنەدرێژ، سڤک، لەولەوە، جرت وپرت، جرت وفرت، زرت وفرت، سازندە، لەوچە، هەرزەگۆ، کەسێکە چەنە زۆرلێ بدا. پەیرێژ، چیرەدرێژ، (کە.) چەنە هەراش. قەرەچەناخ، چەنەباز، چاوەش، چەوچەو،

کەوچەر، دەمەدراو، زاردڕاو، زۆروەڕ، (باک.) بەڕۆک، تەوالغ، دەڤدرپاو، چەقەچناوە، بەسبێژ، بلبلە. ـــ یی: لەوچەیی، پرپێژی، چنچن، دەڤدرپایی، دەمدڕاوی، چەنە زۆر لێدان.

**زۆربۆ هاتن:** تەنگە تاوبوونی گیاندار.

**زۆربۆ هێنان:** تەنگەتاوکردنی گیاندار.

**زۆربوون:** پەرەئەستاندن.

**زۆربێژ:** زۆربڵێ، چەنەسوک. ـــ ی: زۆربڵێیی، چەنەسوکی.

**زۆرتر:** پتر، پێتر.

**زۆرترین:** لە هەموان زۆرتر.

**زۆرجۆ:** خاوەندار، کوتەکدار، زۆردار.

**زۆرچۆنە** (باک.): بە کوتەک، چۆن: دارە چۆن ژ چۆنێ ڤە دگەرێ: دار لە داری دەگەڕێتەوە. بارام مافی خووە زۆر چۆنە ستاند.

**زۆرخانە:** شوێنێکی تایبەتییە هەندێ جار زۆرەوانیێ و گەلێ جۆر وەرزانەوەی تێدا دەکرێ بۆ بەهێزبوونی لەش.

**زۆرخۆر:** خۆرا، (ڕەوا.، خۆ.) تێرنەخۆر، خوارا، چڵەک، مزەوەر، زگبرسی، بخۆر، چڵ، (باک.) چلەک، بلامکەر، چڵێس، نانکوژ، خووەرا، زاخۆراک. ـــ ی: بلامکەری، چلەکی، خووەراتی، چڵێسی.

**زۆرخۆریتی:** چڵێسیتی.

**زۆرخوواز:** زۆرویستە. ـــ ی: شێوەی زۆر خووازتنێ.

**زۆردار:** پرزۆر، هێزدار، بێداد، خورت، زاڵ، گوندار، کەڵەگا، مڵۆزم، بێ ڕەزا، قاندڕ، زۆرکار، زۆردەست، ژێهاتی، دەسەڵاتدار، ستەمکار. هەراش، برشتدار. کشتوکاڵی پرزۆر و داروبارێکەزوو برەسێ. ـــ ی: جەوور، بێ ڕەزایی، کەڵەگایی، خورتی، ستەمکاری.

**زۆردە** (ئەردە.): فەریکەی جۆ و گەنم و نۆکییە. نیوە ووشک، جەرمە.

**زۆردەس:** زۆردەست.

**زۆردەست:** زۆردار، دەستەڵاتدار. ـــ ی: زۆرداری، دەستەڵاتداری.

**زۆردەسی:** زۆرداری.

**زۆرزان:** زانا، فرەزان، پسپۆڕ، جووحە، بەهووردە، کەمۆ. فێڵەزان. ـــ ی: زانایی، فرەزانی، پسپۆری. فێڵەزانی.

**زۆرزانیک** (باک.): بەفرکار.

**زۆرزەوین** (ئەردە.): کێشی زەوی.

**زۆرزۆر:** زەوەند.

**زۆرگەر:** گرخۆر، سوورخۆر. ـــ ی: گرخۆری، سوورخۆری.

**زۆرلێکران:** ناچاربوون، جەوورلێکران.

**زۆرلێکراو:** ناچار، جەرگبراو، جەوورلێکراو.

**زۆرلێکردن:** ناچارکردن، بێدادی لەگەڵ کردن، پێنانە ڕێسی ملی کەسێکی بۆ کردنی فەرمانێک یا گوتنی چتێک بە زۆر.

**زۆرم** (ئەردە.): زۆرمە، قایە، فرەتر، زۆتر، زۆربە.

**زۆرمە:** زۆربە، زۆرم.

**زۆرملێ:** زۆرەملێ.

**زۆرۆ:** ناوی نێرینانە، ـــ ئاغا لە چیرۆکاندایە. زۆردار، بێدار.

**زۆروەڕ:** زۆربێژ، چەنەبێژ، چەنەباز، زۆربڵێ، هەڵەوەڕ. ـــ ی: زۆربێژی، چەنەدرێژی. (هەورا.) فرەواتەی.

**زۆروەنەکریا** (هەورا.): زۆرلێکراو.

**زۆروزەبەند:** زۆرروزەوەند، ئێگجار زۆر. ـــ ی: زۆرروزەوەندی.

**زۆروزەوەند:** چتی زۆر. ـــ ی: زۆرروزەبەندی.

**زۆرویژ:** زۆربێژ. ـــ ی: زۆربێژی.

**زۆریتی:** زوربەیی، گوورانی، زۆری.

**زۆری:** زۆربەیی، زۆرێتی. تۆبزی، کەڵەزەری. بە ـــ: بە تۆبزی، بەکەڵەزەری. شلی و شەپلی.

**زۆزان** (باد.): کوێستان.

**زۆزانقسان:** هەوارگەر، هاوینەهەوارگەر. ـــ ی: هەوارگەری، هاوینەهەوارگەری.

**زۆزانیک:** سەهۆڵکار، بەفرکار. سەهۆڵخانە.

**زۆزگ:** چیایایەکە کەوتۆتە باکووری ڕەوانـدزێ، چیای حەسەن بەگی لەپشت زۆزگییە.

**زۆزۆ** (باک.): جووت جووت، چفت چفت، دوو دوو، دۆ دۆ.

**زۆسک:** چیایەکە لە باکووری ڕەواندزێیە. نێوی کوڕانە.

**زۆف** (زا.): هەزار پێ.

**زۆق** (باک.): زەق، تیژ (بۆ چاو بەکاردەبرێ). جووت: ئەزی چاڤی دوژمن ـــ دەرخەم: ئەمن چاوی دوژمن بەجووتە دەردەخەم.

**زۆقەید** (باک.): شارێکی گچکەی کوردانە لەناو خەرزاندا.

**زۆل:** زۆڵ، پارچەیێکی درێژ لە چەرم یا لە هەر چتێکی بێ. زوویل. (باک.) سیرمە.

**زۆڵ:** فێڵەزان، ساختەچی. (هەورا.، فە.) زۆڵەک، بێباوک، (باک.) بیژوو، بیژی، منداڵێکە، کە لە باوکێکی ڕەوا و ڕاستەقینە پەیدا نەبووبێ. قومەزە. (موک.) پارچە چەرمێکی درێژ براوە، (کە.) زوێل، زیوێر. سیرمە، تیلماسکێکی باریکی چەرمییە بۆ تیرەی کەلاش یا بۆ چنینی کەو و بێژنگ.

**زۆلاک:** زوێل، پارچەیەکی براو لە چەرم.

**زۆڵەک:** جوورە دەنکێکە لە نێو گەنمشامی و نۆک و بەرزو و لۆکە و نیسکدا، کە نابرژێ و ناشکوڵێ. بێژوو، زۆڵ.

**زۆڵچی:** فێڵەزان، ساختەچی.

**زۆڵک** (ئەردە.): بێکارە، زەبوون، بێ کەڵک.

**زۆڵی** (فە.، بابا.): بیژوورێتی، زۆڵی. فێڵ، ساختە.

**زۆم** (شێخ.): ڕۆن، روون، چەوری، پۆ. (هەمر.، باک.، دزە.) هۆبە، تیرە، زووم. چینە هۆبەییکە، کۆمەڵە ڕەشماڵێکە. (خۆ.، ڕەوا.) چەورایی چێشتییە.

**زۆمە** (زرا.): زۆم. کۆمەڵە ڕەشماڵێکە.

**زۆنپ** (باک.): چەکوچ. (باک.) زۆنت، پیکی بەرد شکاندنییە.

زۆنت

**زۆنت** (باک.): چەکوچ. (باک.) زۆنپ.

**زۆنچی** (باک.): دووجار شانە کراو.

**زۆنکاو:** زنە، زەنەک، زۆنگ، تەڕازن.

**زۆنگ:** زنە، زۆنگاو، زۆنکاو، تەڕازن، زناو، قۆپییە.

**زۆنگاو:** زۆنکا، زۆنگ، ئاوگیر، ئاڤگیر، زنـە، زنـەک، تـەڕازن، قۆپیـە، زچاو، زناو. جێگایەکە ئاوی خۆی تێـدا ڕاوەسـتابێ یـان پێـیدا زابێتـەوە و ببێتە قوڕ.

**زۆنی:** ناوی گوندێکییە گۆڕی شێخ موسای زۆڵـی ـ زۆنی لـە نزیـک وێیـە، دەبێ شێخ موسا بۆ خۆی خەڵکی زۆنێ بووبێ پاشی بۆتەزۆڵی (ئـەنزەلی) وادیارە، کە لە مێژووی ژینگاریاندا شێخ عەبدولقادری گەیلانی ژینداری بووە لە چیرۆکی کرمانجاندا گەلێک لەم دوو شێخانە دوواون.

**زۆیێل:** زۆڵ، زۆڵەچەرم. خەوش و خاڵی ناوماڵ.

**زوبان** (شو.): زمان.

**زوبانزان:** زمانزان. ــ ی: زمانزانی.

**زوتوور:** جرجونگانێ.

**زوبەرجەد:** جوورە بەردێکی جوانی نرخدارە.

**زوخ** (ئەردە.): هێز، تین، دەستەڵات.

**زوخاڵ** (هەمە.، زەن.، هەورا.، فە.): ڕەژی، ڕەژوو، خەڵووز، زوغاڵ.

**زوخاڵدان:** خەڵووزدان، ڕەژوودان.

**زوخاڵفرۆش:** ڕەژووفرۆش. ــ ی: ڕەژی فرۆشی.

**زوخاڵی سەنگی** (فە.، هەمە.، زەن.، هەورا.): ڕەژووی بەردی.

**زوخم** (ئەردە.): بنی گیایەکی تاڵی بۆنخۆشە گـەڵای پـان و درێژە و گوڵـی زەردە و لاسکی ڕاست هەڵدەچێ ڕەگی وەکوو زەنجەفیلییە بەڵان گـەورەترە و بۆرە و توند و تیژە کاتێکی بنەکەی پێگەیشت گەڵایەکانی ووشـک دەبـن و بنەکەی لەپزشکێتیدا بەکاردەبرێ.

**زوخمە** (فە.): سیخمە.

**زوڕات:** زەڕات، گەنمەشامی.

**زوڕاتەکێویلە:** کەردڕ، گەنمەشامی سوور.

**زوربـە:** بێ ئـەندازە زۆر. زۆرتریـن، پـەڕە، بەشـی زۆر لـەچت، مانگاکـان زۆربەیان زاوون.

**زوبەسـەندن:** زۆربوون و پەرەئەستاندنی چـت، ئاوەکـە یـا ئاورەکـەـــ ی ئەستاند.

**زوربەیەتی:** زورترینی، زوربەیی.

**زوربەیی:** بڕوانە: زوربەیەتی.

**زورگ:** زوورگ.

**زورمە:** زوربە.

**زوڕنا:** زڕنا، زڕنە، لوولـەیێکی کونکونـە سـەرێکی خـڕ و ئاوەڵـەیە و سەرەکەی تریشـی باریکـە پیکێـکی پێوەیـە، کـە فـووی تێـکرێ دەنگێکی زیقنی لێ پەیدا دەبێ.

**زوڕنـاتـک** (هەو.): سـووڕناتـک، گیایـەکی بـەهارییـە گـەڵای ووردی پـڕە دڕشاوەکەی بۆ دەردی شوقامی چوارپەلی چارەیێ زۆرباشە.

**زوڕناژەن:** زوڕنالێدەر، زڕنابێژ، کەسێکە بزانێ زوڕنای لێبدا.

**زوڕنا سەقەتە:** زەڕنەقووتە.

**زورووکە:** جیکەی باڵندەی بچووکە.

**زوروکەزرووک:** جیکەجیک.

**زوسان:** زستان.

**زوغاڵ:** زوخاڵ، ڕەژی، خەڵووز.

**زوقم:** زوقووم، خووس. سەرمای سەخت، سڕی.

**زوقووم:** زووقم، خووس، زقووم، سیخوڕ، قەریسـەک، خووێسـار، خووێز، ئەو تنۆکە ئاوانەیە، کە لە پاییز و زستانانـدا لـەسەر پووشوپەڵاش و بندیوار و نێوبێستان و باخ و باخچاندا وەکو بەفری دەنوێنن و بەستوونی.

**زوکووم:** گورج، زوو، بەپەلە. زاکە، زیقە، زیکە، هەرا.

**زکوم زکوم:** زنازنا، زاکە، دادوبێداد.

**زولاک** (باک.): پارچە، کوت، لەت.

**زولال:** دۆشاو و هەنگوێنی پاڵێوراو.

**زوڵاڵ:** زەلال، ئاوی ڕوون و پاک و خۆش. دەنگی ــ : دەنگی لـووس و بێ گرێ و گۆڵ.

**زولشەقی** (باک.): نی گۆشت باش.

**زولف:** (هەورا.) زوڵف، بسک، پرچ.

**زوڵف** (هەورا.): بڕوانە: زولف

**زولفانی** (باد.): بەستەیەکە.

**زولفۆ:** نێوی پیاوانە.

**زولفێ:** نێوی پیاوانە.

**زولفی:** نێوی ژنانە.

**زومانزان:** زمانزان، وەرگێڕ. ــ ی (هەورا.): زمانزانی، وەرگێڕان.

**زمڕاندن** (هەو.): زومراندن، تاقی کردنەوە.

**زومڕاو** (هەو.): زومراو، تاقی کراوەوە.

**زوننار:** زیننار.

**زووەردە** (هەورا.): (هەورا.) گوڵەپرووزە. قەرەخەرمان.

**زوها** (باد.): ئیشک، ووشک. ــ نەبۆوە: ووشک نەبۆوە، بۆ جل و بەرگ.

**زوهم** (هەورا.، باد.): چەوری، ڕۆن و پیو.

**زوهۆر** (ئەردە.): شوێنی ئاوەزی، زق، زنەک.

**زویر:** زیز.

**زوێل:** زۆڵەچەرم. (ئەردە.) زبڵی ناوماڵ.

**زوو:** لـەمـەوپێش، لـەمـەوبـەر. کرژ، گورج، ئـازا، تەڕدەست، خێرا، لـەز، هولوو، بەپەلە، بەتاڵوکە، چالاکانە، چاپک، بلەزە، واژی درەنگییە. ــ کە: خێراکە. بەو ــ انە: ژنێزیکڤە.

**زووا** (باک.): ووشک، ئیشک، (باک.) شل.

**زووالـە** (ئـەردە.): زوویـل، زبـڵ، خشت و خاڵ. هەڵماتێکـە، کـە لـە قـوڕ دروستکرابێ یا لە شووشە، گلەی هەرگین.

**زووان** (هەورا.، کە.، فە.): زمان. زیوانی نێو دەغڵ.

**زووان ئاووەر:** زووانداز، زمانتەڕ، زمانلووس.

**زووانە:** زمانە، بڵێسەی ئاووری. هەرچێکە وەکو زمان درێژبێ.

**زووانە بچکۆڵە:** زمانەچکۆڵە، زووانە بوچکەڵە.

**زووانه کێویله:** جووره زوڕاتێکه.

**زووانه مەلیچک** (ئەردە.): تۆوی درەختی بناو.

**زووانەی تەرازوو:** زمانەی تەرازوو.

**زووانباز:** درۆزن، نەرمەبڕ. ـــ ی: زۆڕانی گرتن.

**زووانبەد:** زمانبەد. ـــ ی: زمانبەدی.

**زووانبەس:** دەم بەس.

**زووان بەسە:** زمانبەستە، گیانداری بێ زمان.

**زووانبەسچوون** (ئەردە.): فسەزمانی، پسک بوون، زمانبەستران.

**زووان پارو** (هەورا.): زمانپاراو.

**زووانپاک:** زمانپاک. ـــ ی: زمانپاکی.

**زووانپسک** (هەورا.): فسەزمان، پسک. ـــ ی: فسەزمانی.

**زووان پیس:** زمان پیس. ـــ ی: زمان پیسی، زمان تاڵی.

**زووانتاڵ:** زمان تاڵ، زمان پیس، بەد زووان. ـــ ی: زمان تاڵی.

**زووانحاڵ:** زمانی دڵ.

**زووانخۆش:** زمانشیرین، زمانخۆش،مێروانی. ـــ ی: زمان شیرینی، ڕووخۆشی.

**زووانـدار:** زمـاندار، دەمهـەراش، تـەڕزووان. ـــ ی: زمـانداری، دەمهەراشی.

**زووانـدرێژ:** زماندرێژ. ـــ ی: زماندرێژی.

**زووانـدڵ:** زمانی دڵ، زمانی حاڵ.

**زووانزان** (هەورا.): زمانزان، وەرگێڕ، زانا. ـــ ی (هەورا.): زمانزانی.

**زووانشکان:** زمانشکان. ـــ دن: زمانشکاندن.

**زووانشیرین:** زمانشیرین.

**زووانشیرینی:** زمانشیرینی.

**زووانک** (باک.): ووشک کەرەوە.

**زووانگەزتن:** زمانگەزتن. پەشیمانبوونەوە.

**زووانگرتن:** زمانگرتن.

**زووانگوشادانە:** بەرتیل، بنزمان، ژێرزووان.

**زووانگیر:** تورەکی گیر، پسک، فسەزمان.

**زووانگیران:** زمانگیران.

**زووانلاخستن:** درۆکردن، درۆدان.

**زووانلۆترانە:** زمانی تایبەتی.

**زووانلووس:** زمانلووس. ـــ ی: زمانلووسی.

**زووان مەلیچەک:** تۆوی داری بناو.

**زووانی کوردی** (هەورا.): زمانی کوردی.

**زووانو** (باد.): چتی ووشک.

**زووە** (ئـەردە.): زەوە. جـۆش، جووانـە زووە. جووانکـە. زیپکـەی خۆناسینێ، زیپکەی جحێڵی. (ئەردە.) زاوزۆ، منداڵ، بەچە، بەچ.

**زووبە:** زووکە، پەلەبکە.

**زووبەزوو:** گورجانە، تەڕدەستانە، دەستبەجێ، بە چالاکی.

**زووتر:** گورجتر، خێراتر. بەرتر، لەمەوبەر.

**زووترین:** بەرترین.

**زووتوور** (ئەردە.): جڕجونگانێ، ترۆ، جینگەنە، تووڕە.

**زووخ:** کێمـاوی برین و قوونـێر و هـی تـر، زووخـاو، چڵـک. (ئـەردە.) توانایی، گڕ، هێز، تین.

**زوخاڵ:** ڕەژی.

**زوخاڵدان:** خەڵوزدان.

**زووخاو:** تـاڵاو، ئـازار، دەردەسـەری، زۆرت تـاڵاو بەدەسـتیەوە چێژتـوە. زووخ، زۆخ. زامـەت، خـیزاو، زرزرە، زلزلـە، زرینچکـاو، ئـاوی زەردی برینانە. ـــ هەڵڕشتن: دەردی دڵ گێڕانەوەیە.

**زوودا** (باک.): لە مێژەوەیە.

**زوور:** زبـر، ڕووش، زڤـر، قـانج،کانـە، (هـەورا.) بـاهوو. کـەماچ، نەراوورتی، واژی (لووس) یە. (ڕۆژ.) زوورگ، هەڵەت. کرێن.

**زووران:** زبران.

**زوورانەوە:** کرووزانەوەی منداڵ.

**زووڕانەوە** (ڕەوا.، سوور.): گەڕانەوە، سووڕانەوە. جووڵانەوە، بزووتنەوە.

**زووڕاندن:** زووڕەزووڕکردن، گریانی منداڵ.

**زوورە:** زبرە. ناهید.

**زووڕە:** دەنگی گریانی منداڵە، کە بە سەختی بگری، زیقە.

**زووڕەبا:** ئازارێکی کوتووڕپییە جارجارە لە لەشی مرۆیدا سەرهەڵدەدا.

**زووڕەز:** ترێی یاقووتی. جوورە ترێیـەکی پێست ئەستووری ڕەشـە و زووش پێدەگا.

**زووڕەزە** (بابا.): جوورە ترێیەکە.

**زووڕەزمێ** (ئەردە.): زەرمەزلێ، زۆرەوانی.

**زووڕەزووڕ:** گریانی منداڵە بەبێ پسانەوە. قووڕەقووڕی سەگ.

**زووڕەزووڕ:** زەڕەی گوێدرێژ و ئێسترانە.

**زووڕەس** (ئـەردە.): زووڕەز، میـوە و تەڕەیەکـە زوو پێبگـات بـۆ دەغـڵ و دانیـش بـەکاردەبرێت. ـــ ی (ئـەردە.): یـاقووتی، جووره ترێیەکـە زوو دەگاتێ.

**زووڕەنج:** کەسێکە زوو دڵی بشکێ. ـــ ی: زوودڵشکان.

**زووڕەنج:** کەسێکە زووتووڕە بێ، زوتوور، جڕجونگانی.

**زوورچ** (ڕەوا.): ئـەم جـووره چێشـتەیە: پـەنیر لـەتاوەیدا لـەگـەڵ ڕۆنـی دەتووێنرێتەوەو هێلکەشی تێدەکەن یا پەنیر و خورمایـە دەکرێتـە چێشت. بڕوانە: زرچک.

**زوورزوور:** لوورەی گورگی.

**زوورگ** (بـاک.): زەڕوو. زوور، کەنـەک، هەردوهەڵـەت، زرگ و هەڵـەت، (دەر.) زوویری، نوواڵـە، هەڵـەت. زەوی کـەندەڵان و پرکـەند و کۆسـپە، زەوییەکی بەردەڵانە، کە هەوراز و نشێوی زۆربێ.

**زوورلانک** (خۆ.): سوورناتک.

**زووری:** زبری، دڕی. (وا.) زەڕوو، زێڕوو.

**زوورین** (باک.): لوورواندنی سەگ.

**زووز:** گیایەکی ئاوییە گەڵای لەهی پیزڵ دەکا بەڵام ئەم تەڕتر و باریکترە.

**زووزە** (ئەردە.): (زووڕە) زووقە، زووق، زیقە، ریکە. چێشتێکە هەژاران لەکاتی گرانیدا لە کەشک و پەنیری دروستی دەکەن و زۆر ناخۆشە.

**زووزوو:** زۆربەپەلە، زۆربەتاڵووکە، پەساپەس، پەیتاپەیتا، بەگوڕ، گوڕاوگوڕ.

**زووزووتەخ** (زووززووتەح): گیایەکە.

**زووسان:** زستان.

**زووشک:** دووپشک.

**زووغاڵ** (فە.): ڕەژی، خەڵووز.

**زووغور** (باک.): گورچیلەی وولاخ و ئاژاڵانە.

**زووق:** زیقە، زیکە، قیژەی گریانی منداڵان.

**زووقم:** زوقم، چتێکی سپییە لە شەوی سایقەدا بۆ بەیانی لە شەوانی دوایی پاییز و زستان و سەرەتای بەهارێدا لە بندیوار و سەردیوار و بان و سەر ڕووەکان وەکو بەفر دەنووێنێ.

**زووقووم:** ژەهری مار.

**زووک:** زۆپ، زۆق.*

**زووکا** (باک.): زووکە، گورجبە.

**زووکە:** پەلەبکە، بەلەزبە، تاڵووکەی بکە.

**زووکوورت** (باک.): (هەو.) زووگورد. ڕەبەن، سەڵت.

**زووگوور** (شا.): پێداویستی.

**زووگورت** (باک.): مەحکەم، قاییم. ـــ ی: ڕەبەنی، قایمی، ڕەش و ڕووتی. ڕەش و ڕووت.

**زووگورد:** زووگورت. ـــ ی: زووگورتی.

**زووگین** (ئەردە.): لەمەوپێش، بەرلە ئێستا، لەمەوبەر.

**زووم** (باک.): هۆبە، زۆم. تیرە. دەستەخێوەتێکە.

**زوونا:** گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک ڕێحانە وایە، گوڵێکی شین دەگرێ.

**زووهەڵبەس:** داهێنەر. هاکوو، هکۆ، بێ بیرکردنەوە. ئاخۆتن، سەرسەری.

**زووهەڵبەست:** دەستبەجێ، بەدی هێنەری کارێک یا ئاخۆتن و مەبەسێک.

**زووهەڵبەستن:** بێ بیرکردنەوە داهێنان، ئاخۆتن و کارکردن.

**زووێر** (ئەردە.): زوویر، زیز. ـــ ی: زیزی، سڵی.

**زووێڵ** (ئەردە.): زبڵ، خشت و خاڵ.

**زوویر:** زیز، سڵ، کز، زیوێر، دڵشکاو. ـــ بوون: زیزبوون، دڵگیربوون. ـــ کردن: زیزکردن، حەیداندن، ڕووپەرکردن. ـــ ی (دەر.): زوورگ، کۆسپە، زیزی.

**زوویک** (دەر.): تێپەڕینی لەشکر بەپێش سەرکردەی خۆیدا.

**زوویل** (باک.): زۆڵە چەرم.

**زوویڵ** (ئەردە.): زبڵ، خشت و خاڵی ناوماڵ.

**زە** (باک.): زێ، زی. ئەندامی شەرمی وولاخ و ئاژاڵ و ماڵاتانە.

**زەا** (باک.): زەها. زەبەللاح، لەندەهۆر.

**زەار** (باک.): (باک.) زەهار.

**زەە** (هەورا.): زاورزۆ.

**زەوم** (باک.): چەوری، بۆ، قەڵەوی.

**زێ:** زە، کوز، کوس، قوز، ماڵ. ئەندامی شەرمی ماڵات و ڕەشەووڵاخ و ئاژاڵانی مێیینە. (فە.) نیشتمان، زێد. چۆمێکی زۆر گەورە وەکوو زێی بادینان، زێی موسڵ. ناوی تیپێکییە لە هەژدەمین خانەدایە لەناو (ئابێ) ی کوردیدا. ڕێگە، ڕەووشت، ئەندازە. یەکەمین سەردانی بووکێیە بۆ ماڵی باوکی، بووکامە چوویە زێ: چۆتە ماڵی بابی.

**زێبار:** زیبار، پارچەیەکە لەخاکی کوردستان لە باکووری موسڵێیە. ـــ ی: دانیشتووی خاکی زیبار.

**زێچ:** ژەک. (ئەردە.) زیت.

**زێد** (کە.، هەورا.): نیشتمان، مەڵوەن، مەڵوەند. شوێنێکە مرۆی تێدا بحەسێتەوە. گۆڕ.

**زێدەوان:** پاسەوانی گۆڕ.

**زێر** (زا.): زیر.

**زێڕ:** تەڵای زەرد، لیرە و خشڵی ژنان لەکانی زێڕ دروست دەکرێت، زەڕ. (زا.) زیر.

**زێڕاب:** گۆڕیچەیەکە لەناوماڵان ئاوی پیسی پێدابڕوات.

**زێڕاو:** ڕەهەن. جۆگەی سەرداپۆشراو وەکو هی ئاودەستان، بەڵوعە. ئەردە، زێراب. ـــ ی: (باک.) زیرهەڵی.

**زێڕەسەر:** سەرانە، باج.

**زێڕەڤان** (باک.): چاودێر، سەرپەرشتی کار، ئاگادار. ـــ ی: چاودێری، سەرپەرشتی، ئاگاداری.

**زێڕەک** (باک.): پیش پیشە، زرنگ، زیرەک.

**زێڕەوشان** (موک.): (باک.) بەرڤێژک. پووڵ و شیرنیات و ئەوانەیە، کە بە شاباش بەسەر بووکانیدا دەکەن، کە گەیشتە بەردەرکی زاوای.

**زێڕباف:** زێڕبافت.

**زێڕبافت:** ئەنراوی گوڵ بە سوورمە.

**زێڕبەند:** پشتێندی زێڕ، خشڵی بەرسینگ، (باد.) زێڕەبەند.

**زێڕپۆش:** زەڕپۆش. ـــ ی: زەڕپۆشی.

**زێڕکار:** زێڕینگەر، زەڕەنگەر. ـــ ی: زێڕینگەری.

**زێڕکەش:** زێڕکێش.

**زێڕکەفت:** زێڕن، زێڕکێش، زێڕکۆلاندی، زێڕپۆش، ئاوەزێڕ. تۆزێکە وەهەر خەتێکی تازە چاپکراو بکەوێ وەکوو زێڕ لێدەکات بەو مەرجەی، کە خەتەکە ووشک نەبووبێتەوە.

**زێڕکفتی:** ئاوەزێڕی، زێڕپۆش، زێڕن، ڕووکێشی زێڕی.

**زێڕکۆلاندی** (باک.): زێڕکفت، زێڕن.

**زێڕکێش:** ڕووکەش، زەڕکەش، زێڕکفت، (باک.) تامزێڕ. ـــ ی: ڕووکێشی کانێکی بە ئاوی زێڕ کردن.

**زێڕگەر:** زەڕگەر، زێڕینگەر. ـــ ی: زێڕینگەری.

**زێڕن:** چتێکە لە زێڕی دروستکرابێ، زێڕین، بزێڕ، زەڕی. نێوی ئافرەتانە.

**زێڕوو:** زەروو.

**زێڕوزیچ** (باک.): زاروزیچ.

**زێڕهەڵی** (باک.): زێڕاوی.

**زێڕی**: زێڕین.

**زێڕین**: زەڕی، زیڕن، بزێڕ، چتێکە لە زێڕی دروستکرابێ.

**زێڕینگەر**: زێڕکەر، زەڕنگەر، زێڕکار. ــ ی: زەڕنگەری، زێڕکاری.

**زێ زێ**: نێوی ئافرەتانە.

**زێسان** (ئەردە.): زەییستان، زاو، زاییگ، زاگ. ژێرزەمین، ساردا و، سەرداو.

**زێڵ** (هەورا.): جەرگ، جگەر.

**زێڵ** (ئەردە.): ژێر، سووک، زیل، دەنگی نزم. (هەورا.) دڵ. ــ سیاو: دڵڕەش. (هەورا. کۆن) کەنەفت، پەرێشان. (هەورا.) هۆش، هەست. دڵ و دەروون.

**زێلکە**: بروانە: زیلکە.

**زێڵۆشێویای** (هەورا.): ڕشانەوە.

**زێڵۆشیوو** (هەورا.): بڕشێنەوە.

**زێلوو** (باک.): زەروو.

**زێندان** (باک.): زیندان.

**زێندین**: نێوی پیاوانە.

**زێنێ** (باک.): تیژ (بۆ تیغ). قوولکە.

**زێو**: زیڤ، زیو. (باک.) سالانە. جێژن، جەژن.

**زێوار**: چتێکە لە قەراخی چتێکی تر گیرابێ. لێوار، قەراخ، کەنار.

**زێوارە**: زێوار.

**زێوارەی کەوش**: لێواری کەوش.

**زێوارگرتن**: لێوارگرتن.

**زێوان**: زێدەوان.

**زێوە**: چەمەر، کۆ، کۆمەڵە. ــ گرتن: کۆمەڵەگرتن.

**زێوەگرتن**: کۆمەبستن، کۆبوونەوە.

**زێوکفت**: ئاوەزێو، زێوەین.

**زێوکێش**: ڕووکێشی زێوی، ئاڤزێڤ، ئاوەزێو. ــ ی: زێرکفتی.

**زێوگەر**: زیڤگە، زیڤکار.

**زێوین**: (باک.) بزیڤ.

**زی** (ڕەوا.): خەتی نیوەڕاستی سەرییە لەکاتی دابەشکردنی پرچ یا کاکۆڵاندا. ڕاستە، ڕاستۆک. (زرا.، کۆ.، هەو.، خۆ.، باک.) ئێخە، بەرۆک. (زرا.، کۆ.، هەو.، خۆ.) چاڵووک. زریشک. (بلۆ.) قەڵەم، قەرەم. جووره کشتەکێکە کەوش دروو کەوشی پێدەدروێ. هەست، سووسە، هۆش، منە. زەه، زهە، زێ. ئەندامی شەرمی ئاژاڵ و وولاخ و هەموو جوورە ماڵاتێکییە.

**زیا** (باک.): هەزیا، زها، هەژدیها، ئەژدیها.

**زیاکار**: زیانکار. ــ ی: زیانکاری.

**زیاکەر**: زیانکەر.

**زیان**: چزە، کەتن، ئەستێل، وەی، وەزەن، وەزەندە، زیۆن، خەبینەت. ــ پێگەیاندن: پێدانان. ــ کردن: تێداچوون، چزەکردن، تێشکان، دانان، دزڕاندن، ئەهووم، لەکیس چوون، بۆ کشتوکاڵ و ڕەز و بێستان و شینایی: وولاخەکە کەوتە ناو زیانێ واتە چووە ناو کشتوکاڵ و بێستان و ئیتر.

**زیانەخرۆ**: زیاندەر، زیانکار، زیانەخورۆ. ــ یی: زیاندان.

**زیانەخورۆ**: گیاندارێکە گیاندارێکی تر بخوا یا چتێکی بخوا. بەزیان، ئازاردەر.

**زیان پڕکردنەوە**: تێهەڵهێنانەوە.

**زیان پێگەیاندن**: داغکردن، مۆرکردن، تێشکاندن، پاماڵکردن، پایماڵکردن.

**زیاندار**: بە زیان، چتی بە زیان. ــ بوونی مرۆ بەجۆرێک، کە زیانی لێ بوەشێتەوە.

**زیاندان**: زیانگەیاندن.

**زیاندەر**: زیانی خەرۆ، زیانەخرۆ، وەیدەر، زیانکار، زیانۆ، (باک.) فەتراک، دەر.

**زیانکار**: زیاندەر، زیانەخورۆ، زیانگەیێن. ــ ی: زیانداری.

**زیانکردن**: تێشکان، دزڕاندن، دانان، تێکەوتن، ئەهووم، تێداچوون، چزەکردن. زیاندان، ماڵات لە کشتوکاڵی ئەم و ئەو کردن.

**زیان گەیاندن**: ئێش و ئازار یان زیان بە کەسێکی گەیاندن.

**زیانگەیێن**: زیانکار، زیانەخەرۆ.

**زیانگەیین**: زیان دیتن، زیان پێ گەیشتن.

**زیانۆ** (باک.): زیانکار، زیاندەر.

**زیانی**: زیانکردن، زیانی کشتوکاڵە، کە وولاخی کەسێکی بێگانەی چوویێتە ناو.

**زیانی خەرۆ**: شەرفرۆش، زیاندەر، تەڤدا، زیانکار. ــ یی: تەڤدایی، شەرفرۆشی، زیان گەیاندن.

**زیانی خرۆ**: زیانەخرۆ. ــ یی: زیانەخرویی.

**زیەلک** (باک.): زراو.

**زیبک**: ویست، خووازت.

**زیپ**: زۆر هێنان و تەنگەتاوکردن، زیپە. (باک.) لێکدانەوەیێکی کوردییە: کە مانگێکە لە نێوانی ١٥ی شبات و ١٥ی ئازاردا. ڕەشەبا، باوبارانی سەخت. (باک.) تەرزە، بەرخورک، تەرەز.

**زیپە**: ڕۆژنای ڕەش و شووم لە ماڵێدا. (باد.) بورجی پیرێژن.

**زیپک** (باک.): تەرزە. زیپک. (خۆ.) کورووژم هەڵاتن لەسەرمان.

**زیپکە**: (موک.) قنچکە، شینۆک، (دەر.) دشپۆکە، (ڕەوا.) تشپۆ، تشپۆک. ئاگرۆک، (باک.) زیپک، (ڕەوا.) زیپلکە، (بابا.) زیتکە، زپرکە، گرمژە، پیرۆزکە، وورده کولکێکی سەرتیژە لە لەش دەردێ. ــ ی عازەبی: جوانە ژۆ، جوانکە، شانک. (باک.) تەرزەی ووردی بەهارییە، گلێرە.

**زیپلک**: زیلمۆ، ژیلمۆ.

**زیپلکە** (ڕەوا.): زیپکە.

**زیپۆ**: نێوی پیاوانە.

**زیت**: قیت، ئازا و توندوتۆڵ، ووریا. (باک.) دەنگی زورنا و بلوێر و چتی وایە. زەق، زیچ، زرت. چاو ــ: چاوزەق، براق چاو.

**زیتە:** دارێکی باریکە لە فاقەدا سەرێکی بە کشتەکێکەوە بەستراوە بەژێیەکەوە و سەرەکەی تری، کە دووفاقە دەنکە گەنمی تێدەخرێ، کە بە دەزووەکەوە بەستراوە بە ژێیەکەوە. ماشە، زامنە.

**زیتەزیت:** زەقەزەق.

**زیتەڵ:** زیت.

**زتەڵە:** زیت.

**زیتەوبوون:** زیت بوونەوە، زیچەوبوون.

**زیتەوکردن:** زیتکردنەوە، براق بوون.

**زیتبوونەوە:** وووریابوونەوەی گیاندار.

**زیتک** (باک.): شەق (بەپێ)، لەقە و لووشکەی وولاخ.

**زیتکە** (بابا.): زیپکە. جوورە ماسییەکی گچکەیە بەقەد قامکێکییە و نیتر لەو ئەندازەیە گەورەتر نابێ.

**زیتکێ** (بابا.): تیرەیەکی کوردە لەلای هۆرەمارێیە.

**زیتۆر:** زیتۆل.

**زیتۆل** (باک.): ڕیندۆڵ، وونجڕ، جل و بەرگی شڕ و ڕزیوە، (باک.) ڕیقار.

**زیج** (ئەردە.): پەراوی ئەستێرە ناسی. (باد.) کلک هەڵتەکێنە(باڵندە).

**زیـج** (باک.): منداڵ، زارۆ، نەوە، نەتەوە. زیچەل، (باک.) زیـرچ. (شەم.) مێو. تەختەبەند. ڕیخ. (باک.) زار و زیچ. زیت.

**زیچک** (باک.): فێڵ، ساختە.

**زیچکاو:** زرینچکاو.

**زیچل** (باک.): زیچ.

**زیخ** (کە.، باک.، بار.، باد.، برا.): ئازا، بە جەرگ، زیرەک. لمت، ماسە. خیز، چەو، ووردەبەرد. (باد.، باک.، بار.، برا.) چەپەخوون. (هەورا.) لم، لیم.

**زیخەڵان:** خیزەڵان، تەزێلاک. (هەورا.) زاخیران، شوێنێکە خیزی زۆربێ.

**زیخەڵانی:** زیخەڵان.

**زیخماڵ:** خیزەڵان.

**زیدەوان** (هەورا.): پاسەوانی گۆڕی پیاوچاکان.

**زیر** (باک.): جیکەی باڵندانە. زیرەزیرە.

**زیراف** (باک.): چتی دورر، باریک، زراو. ئارد.

**زیراندن:** قیژاندنی زۆر بەتوندو تیژی.

**زیرانن** (ئەردە.): زریکاندن، زووڕاندن، زیراندن.

**زیراو:** زێڕاو، بەلووعە.

**زیرە:** جوورە بەهاراتێکە لە پەلاوێ دەکرێ دەنکی وورد و بۆنی خۆش و سەوزکارە. (خۆ.) گیایەکی بۆنخۆشە بۆ زگێشەی باشە.

**زیرە:** چریکە، قیژە، دەنگی گریانی منداڵ و ژنانە، دەنگی تیژی گیاندار.

**زیرەزیر:** زیقەزیق، چریکەچریک، زیرەی یەک لەدوای یەکتری، زیرەی منداڵ و ژنانە لەکاتی گریان و لێقەومانێدا.

**زیرەفان** (باد.): پاسەوان.

**زیرەک:** ووریا، زرنگ، (موک.) زرینگ، چەپخوون، ووشیار، هوشیار، بلیمەت، تێگەیشتوو. (موک.) بەخۆوەژیو، بەکار، بژیو، ئازا، (باک.) پەیک، شاک، زیخ. چسپان. مەحلان، جەرجەپە، مێرئاس، فەلەیتە. (موک.) سەلیقەدار، بسەلیقە، پیاوناس. نا ـــ: کەودەن، گێل، حۆل، (کە.) پاتاڵ.

**زیرەکردن:** زیراندن لەترسان یا لە داخان.

**زیرەکی:** ژیری، هۆش، سەلیقە، ووشیاری و زرنگی، هۆشیاری.

**زیرەلێهەستان:** زیراندن، زیرەکردن.

**زیرەلێهەستاندن:** وەزیرەخستن.

**زیرەوان** (هەورا.، باد.): شۆفار، چاو.

**زیرەوانی** (هەورا.): شۆفاری.

**زیرەی ڕۆمی:** جوورە زیرەیەکە.

**زیرەی سەوزە:** زیرەی کەسک.

**زیرچ** (باک.): زیچ، جیقنە.

**زیرزیر:** دەنگ و جریوە و جووکەی چۆلەکانە.

**زیرزیرک:** ووزووزە، جـوورە باڵندەیەکـە وەمێشـی دەچـێ لەسـەر داران هەڵدەنیشێ و دەنگێکی لێوەدێ وە (ووزەووز)ێ دەچێ.

**زیرفچک** (باد.): هەنار، نێوزگ.

**زیرفچک** (باد.): چێشتێکە بریتییە لـە سـوورکردنەوەی پـەنیر لـەناو ڕۆنیدا. (باد.) گیایەکیشە وە کوراەدەی دەچێ و ناخورێ.

**زیرگ** (ئەردە.): چڵک.

**زیرگن** (ئەردە.): چڵکن.

**زیرگۆن** (باک.): جوورە گوڵێکە.

**زیروبەم:** زیل و بەم.

**زیروهۆڕ:** زیرەزیری زۆر.

**زیز:** نەبان، سوور، زوویر، ڕووپەڕ، تۆراو، سرک، (باک.) خوو، توورە، سڵ، تۆریاو، ئەنگر. ـــ بوون: تۆران، خەیدین، تۆریان، ڕووپەڕبوون، توونەو تلووربوون. ـــ کردن: تۆراندن، تۆریاندن، خەیداندن، ڕووپەڕکردن.

**زیزانە** (بابا.، شا.) زیوان (گیا)، گیایەکـە لـەناو دەغلاتـدا شـین دەبـێ بەرێکی ڕەشی تاڵی هەیە.

**زیزەڵە** (شا.): ئەسکنجە، (شن.) قوڵقوڵە.

**زیزەلە** (شا.): لەجێ چوون (تەنها بۆ ئەسکنج.

**زیزموک:** قالۆچەیەکی باڵدار و سەوزە.

**زیـزی:** جوورە کوللەیەکـە هەمیشـە دەنگی لێـوە دێ هاوینـان لـە زەویـاندا گەلێک دەبیزێ، بەدەنگی خۆی ناودەبرێ. زوویری، سڵی.

**زیزیک:** مێشێکی سەوزە بەقەدەر هەنگێکییە بەلقی میوانەوە دەنووسێ و دەمرێ.

**زیست** (ئەردە.): زینگی، ژیان، زیندەگی.

**زیسک** (شن.): موسلی، سەلکی گیایەکیە وەپیوازی دەچـێ بـەلاّن پتەوە و لەنێو ترشیاتی دەکرێ.

**زیفان** (باک.): مریشکی گچکەن.

**زیف** (دزە، هەورا.): پڕووپووچ.

**زیف** (باد.): زێو.

**زیڤار** (باد.): هەژار، بەدبەخت.

**زیڤاری**(باد.): بەدبەختی، هەژاری.

**زیڤال** (باد.): هەژار، بەدبەخت.

**زیڤڕ** (باک.): خڕکەبەرد.

**زیڤزیڤە**(باد.): هەوارپی.

**زیڤکەر**: زیوکار، زێوگەر کەسێکە خشڵ و چتی تر لە زێوی دروست بکات.

**زیڤنک** (باک.): زڤنک.

**زیڤنگەر** (باد.): زێوگەر، (باد.) زیڤگەر. ـــ ی(باد.): زێوکردن.

**زیق**(ئـەردە.): وورگ، ناوزگ. (باد.) زیڤزیڤ، هەزارپی. (باک.) دەنگی دەرکێشانی خەنجەرو دەرکە کردنەوە و هی خوراندنییە. (ئەردە.) زووق، زیقە، گریانی منداڵ.

**زیقان**: زیقاندن، زیقەلێوەهاتن.

**زیقاندن**: زیکاندن، چریکاندن، زیقەکردن، جریکەکردنی(مەلان).

**زیقانن**: زیقاندن. ماسیگرە، ماسیەوچنە، ماسی خۆر، مەلێکە لاق و دندووکی درێژ و سپی و سەرباڵ ڕەشە وە لەقلەقی دەچی لە کۆتر گچکەترە بە زۆری لەناو ئاوێدادەنیشێ، هەمیشە دەزیقێنێ.

**زیقاوڵە**: گیاندارێکی بۆری چوارپێیە لە دەڵەک گەورەترە، پێستیشی بەنرخە.

**زیقە**: جیکە، جیقە، دەنگێکە لە خۆشیان یا هی پەڕەووری گچکەیە. زیکە، چریکە، دەنگێکە لە زیلە گەورەترە و ناخۆشترە.

**زیقەزیق**: زیکەزیک، چریکەچریک، زیقەی یەک لەدووای یەکتری.

**زیقن**: زیکن، گیاندارێکە دەنگی زیقەی لێوە دێ، زیقەی یەک لە دووای یەک.

**زیق و هۆڕ**: زیقەزیقی زۆر.

**زیک**(شار.): کشت. (شار.) کوورژ. کرووژم هەڵاتنی چەرم و ئیتر لە گەرمان. (ڕەوا.) گرژ، ڕاست. ـــ بوون: کرژ و ڕاست بوونەوەی مووی مرۆڤانە لە گەرمان. (زا.) کشتەکی مێوکراو.

**زیکاندن**: زیقاندن، چریکاندن، زریکاندن، زیکەکردن.

**زیکانن**: زیکاندن.

**زیکە**: زیقە، زریکە، چریکە، دەنگێکە تیژ و باریک و ناسک بێ.

**زیکەزیک**: چریکەچریک، زیقەزیق. زیکەی یەک لە دووای یەک.

**زیکریلـە** (مـوک.): تەتەڵـەمیران، (ڕەوا.) مەڵکەسـەن، (زەن.) توورتکەشوانە. کرمێکی ڕەش و تووکنە لەسەر گیایان تەونی دەکات.

**زیکن**: زیقن، کەسێکە زیقەی بێ.

**زیل**: پارچەیەکە لە ئامرازی ئاهەنگ و بەزم، کە زیلەی لێوەدێ. زەنگی ئاگادار کردن و بانگ کردنە. هۆزێکی کوردە لە ئێرەوانێدا. (هەورا.) هەراوهووریا، هەراهەرا، قیرەقیڕ، زریکە، چریکە، بۆ دەنگی تیژ و باریکیش بەکاردەبرێ. (باک.) سەری گیایەکیە تازە لە زەوی دەرهاتبێ، چووزە، چووزەڵـە. زەنگێکە دەستی پێدانرێ دەنگی لێوەدێ بۆ بانگ کردنی بەردەست.

**زیڵ**: دەنگی زیل.

**زیلا**: ئێلێکی گەورەی کوردە (مل و زیل) هێندێک دەڵێن سەرچاوەی نەتەوەی کورد ئەوانن، ئەمەش درۆیە چونکو کورد لەوان زۆر کۆنترە و ئەوان خۆیان ئێلێکن لە کورد.

**زیلان** (زا.): ڕێسمەی دەرکێیە. (باک.) لاولاوەی دەرک و پەنجەرانە لە داری، ڕێزە لە داری.

**زیلانزەر** (باک.): (باک.) کەڕەنگ. کەنگرێکە تازە سەری دەرخستبێ و شین بووبێ.

**زیلە**: زڵلە، شەپەلاخە. دەنگێکە لەزیکە گەورەترە.

**زیڵە**(ئەردە.): زیلە، دەنگی ناسک.

**زیلەزیل**: زیلەی یەک لە دووای یەکتری.

**زیڵەمۆ**: ژیڵەمۆ.

**زیلەمۆ**: (هەورا.) ژیڵەمۆ، ژێلی، (کۆ.) ژیلک، (شار.) ژیل، (باک.) تەراف، خووەلی مەرمۆتک.

**زیلک**(کۆ.): زیلەمۆ. (زا.) قیتکە.

**زیلکە**: جوورە ترێیەکی ناسکی مزری سپی بزمارکوتە،ساڵێ دووجاران بەر دەگرێ.

**زیلۆ** (زا.): زەروو، زێروو.

**زیل و بەم**: دەنگی نزم و بەرز. زیروبەم. چەشنە مرازێکی ئاهەنگ و بەزمێیە.

**زین**: چتێکە لە قایش و تەختە لە پشتی وڵاخی بەرزە دەکرێ و ئاوزەنگیشی پێوەیە تا سووار لەسەری سوواربێ. مارەکە. نێوی ئافرەتانە لە بنچینەدا(ژین) بووە سەیدایێ خانی چیرۆکی مەم و زینی خستۆتە ناو کراسێکی نیشتمانیەوە: زینی بە ژین و مەمی بە نەتەوەی کورد داناوە وادەردەخا، کە نەتەوەی کورد ژیانێکی سەر بە خۆی دەوێ و ئاواش ڕێگا نیشاندەدا:

> بێ جەنگ وَ جیدال و بێ تەهەوور
> زین و بەرگ قەت ڤێ شوغلی مەکەن تەصەوور

ملە، کێوی چکۆڵەیە، زینوو.

**زینات** (زا.): زۆر و ستەم.

**زیناتکر**(زا.): زۆردار، ستەم کار.

**زینا**: زیننار.

**زیننار**: کەمەربەند. پشتێندێکی تایبەتی قەشە و کەشیشانە.

**زینان**: زیندان، گرتووخانە. (ئەردە.) گۆپکەکردن.

**زیننانەوان** (هەورا.): زیندانەوان.

**زینە**: زیندوو، گیانلەبەر.

**زینەماڵ**: زیندەماڵ.

**زینبەر** (باک.): زەوی و بەردی بڵند لە کەنار ئاواندا.

**زینبری** (باد.): بریندار.

**زینپۆش**: پەردەیەکی جووانە بەسەر زینیدا دەدرێ.

**زینپۆشی**: سەرپۆشێک بەسەر زینیداگرتن.

**زینپێچ**: بەنێکە زینی پێدەپێچرێتەوە.

**زینچکلو**: زرینچکاو.

**زیندان:** چاڵی زۆر قووڵ، کە جاران تاوانبارانیان تێدا ڕاگیر دەکرد. گرتووخانە، بەند، بەندیخانە. واتەکەی جێگای زیندووانە، جێگای زیندووان.

**زیندانەوان:** بەندیخانەوان، بەندی وان، نۆبەتچی بەندییان، یاساوڵی زیندان. ـــ ی: بەندیخانەوانی.

**زیندانی:** بەندی، گیراو، گرتوو، کەسێکە لە زیندانێدا بێ.

**زیندە:** زیندوو، گیانلەبەر.

**زیندەبەچاڵ:** زیندەبەگۆڕ.

**زیندەبەچاڵکردن:** گیاندار بە زیندوویی ناژتن.

**زیندەبەگۆڕ:** زیندەبەچاڵ.

**زیندەبەگۆڕکردن:** گیانلەبەرێکی بە زیندوویی خستنە ناو چاڵەوە و سەر داپۆشینی بە خۆڵ یا ناژتنی.

**زیندەچاڵ:** زیندەبەچاڵ.

**زیندەگانی:** زینگی. (ئەردە.) زیندگانی، زینگانی. ژیان، زیندوویێتی. قووت، قوویت، زنەیی.

**زیندەگی:** زیندوویێتی، زیندەگانی.

**زیندەماڵ:** گیاندار، ئاژاڵ و وولاّخ و ڕەشە وولاّخی ناوماڵ.

**زیندەوار:** تاک، کەس، داڵەوا، ـــ ی لێ نەهێشتن: قڕانی تێخستن. گیان لەبەر، گیاندار، زیندەوەر. مۆریانە، کێسک. گۆسان. (لوڕ.) زەلوومۆر، سەرتەشی، مۆرانە، جرۆجانەوەر.

**زیندەواری گچکە:** پووت، پووعە.

**زیندەوان:** بەڕێوەبەری بەندیخانە.

**زیندەوەر:** زیندووی گیانلەبەر.

**زیندروو:** زینساز، زینکار، (باک.) زینکەر، زین چێکەر. زینگەر، زیندووز.

**زیندروون:** دروونی زین.

**زیندرووێتی:** زینسازی، زینگەری.

**زیندگ:** زیندوو.

**زیندوو:** زنە، زندی، زنوو، (هەو.) زیندی. گیانلەبەر، گیاندار، تناوور.

**زیندووبوونەوە:** بووژانەوە، گیان وەبەرهاتنەوە، بۆ گیان لەبەران و ڕووەکان.

**زیندوور:** زیندروو.

**زیندووکردنەوە:** بووژاندنەوە، گیان وەبەرخستنەوە، بۆ تازەکردنەوەی چتی کۆنیش بەکاردەبرێ.

**زیندوویێتی:** زیندوویی.

**زیندوویی:** گیانداری، زنەیی، ژیان، زیندوویێتی.

**زیندی** (هەو.): ئەسپێ و کێچ. زیندوو.

**زیندیق:** خوانەناس.

**زینساز:** زیندروو.

**زینسازی:** زیندرووێتی.

**زینکردن:** زین لە پشتی وولاّخ کردن.

**زیندیقی:** خوانەناسی.

**زینکۆ** (ئەردە.): قەڵپووزی زینی، بەرکۆ.

**زرینگ:** زیندوو، زیرەک.

**زرینگان:** زرنگانەوە.

**زرینگانەوە:** زرنگانەوە.

**زرینگاندن:** زرنگاندن.

**زرینگاندنەوە:** زرنگاندن.

**زینە:** زیندوو.

**زینەماڵ:** زیندەماڵ، گیاندار.

**زینکردن:** زین خستنە سەرپشتی وولاّخ و قایم کردنی.

**زینکۆ** (ئەردە.): قەڵپووزی زین.

**زینگ:** (ئەردە.) زیندوو، گیاندار، گیانەوەر. زینە.

**زینگان** (بابا.): زیندان.

**زینگانی** (ئەردە.): زیندەگانی، ژیان، بژێو، ژیوار، زینگی.

**زینگەبەچاڵ:** زیندەبەچاڵ، زیندەبەگۆڕ.

**زینگەچاڵ:** زیندەبەچاڵ، زیندەبەگۆڕ.

**زینگەوەبوون:** زیندووبوونەوە.

**زینگەوەکردن:** زیندووکردنەوە.

**زینگوو:** زیندوو.

**زینگی:** زیندی.

**زینگیر:** سینگێکە لە تەویلەدا زینی پێدادەکرێ.

**زینان** (ئەردە.): زیندان.

**زینانەوان** (ئەردە.) زیندانەوان.

**زینە** (ئەردە.): زیندوو، زینە.

**زینوو** (موک.): زین، کە لەمل، کەل، بستوو، ملە. باسکی شاخ و پاڵ. بڵندایی سەرەوەی گەرووی شاخی نزم.

**زین و بەرگ** (ئەردە.): زین.

**زین ووراز** (هەورا.): زیندروو.

**زینووی شێخ:** گوندێکی خۆشە لە نزیک شارۆچکەی حاجی ئۆمەران.

**زینی:** تەپۆڵکە. (باک.) تیژ (تیغ). (باک.) قووڵکە.

**زیو:** زێو، کانێکە پارە و هەندێ خشڵی ژنانی لێ دروستدەکرێ.

**زیوا:** گوڵەزەنبەق. (ئەردە.) جوان، شۆخ، شیرین.

**زیوار:** زیڤار، هەژار، بەدبەخت. (سیرمە): تووێ، پارچەی تەنک و ناسک، پیشاڵی چتمەکی دڕاو.

**زیوارەی کەوش:** قەراخی کەوش.

**زیوارەی گۆڕ:** قەراخی گۆڕ.

**زیواری:** زیڤاری.

**زیوال** (باک.): زیڤار.

**زیوالّ** (کە.): تووێ، پیچەک، برزۆڵە، پارچە، زیوار.

**زیوان:** (باک.) دنێب، خەربەند، خەربەنگ، (کە.، هەو.) مرۆر، (بابا.) زیزانە، زریزانە، گیایەکە گوڵەکەی شینێکی کاڵە پانی بەقەدەر دەفلسانە لەنێو گەڵیدا شین دەبێ و بستێک لەوی بڵندتر دەبێ ڕەنگی سوور یا ڕەش، کە زۆری لەگەڵ گەنمی بکەوێ تاڵی دەکات، کەدانەکەی بخوری خەوی دێنێ، کە بەکوتراوی تێکەڵ بە شیری بکرێ و لە چاوی ژاندارکرێ ژانی دەشکێنی.

**زیوانخۆرە:** ئاڵیگوڵینگ، ئاڵینگرلینگ.

**زیوانن**(ئەردە.): جووڵاندن.

**زیۆن** (هەورا.، لو.): زیان، زەرەر.

**زیوە** (ئەردە.): جیوە. جووڵە.

**زیوەر:** خشڵ، چەک، تیتە. (باد.) بە بەردە سپیە پانە گچکەکانی نێو ئاوێ دەڵێن، کە دەبریقێ. نێوی پیاوانە. نازناوی هەستیارێکی زۆر بەرزی کوردی سلێمانی بووە.

**زیوزیوە:** ویزەویز.

**زیوور** (بالە.): هەزار پێ.

**زیوێر** (ڕەوا.): زۆڵە چەرم.

**زیوی**(ڕەوا.): هەزارپێ.

**زیویان** (ئەردە.): جووڵان، بزووتن.

**زیوین:** چتێکە لە زیو دروستکرابێ.

**زییە:** درکە زی.

# ژ

**ژ:** تیپێکی ئابێی کوردییە. (باک.) ش، هەم، زیقیژ نرخدارە: زێویش نرخدارە. (باک.) لە، یەکێ ژوان، یەکێک لەوان، ژباژێرهات: لەبازاڕەوەهات. (باک.) بە، ژدەرێ دەربازبوو: بەدەرکەدا چووەدەرێ. ژوی ناساخیێ گەلێک ژارکەتم، بە هۆی ئەو ناساخییەوە زۆر لاوازبووم.

**ژار** (هەورا.): خڵتەی مۆدنە و سەبیلەوئیتر. (هەورا.، باک.) هەژار، بەلەنگاز. (باک.، کە.) ژەهر، زار، زەهر.

**ژار بوون:** هەژاربوون. (باک.) نەخۆش و دەردەداری کۆن.

**ژاراو:** زاراو، ژەهراو. ـــ ی: ژەهراوی.

**ژاردار:** ژەهردار. ـــ ی: ژەهرداری.

**ژاردان:** ژەهردان، دەرماندان.

**ژارقەننە:** ژارقەننە.

**ژارقەنگە:** ژارقەندە، ژارقەننە.

**ژارقەننە:** خڵتەی مۆدنە و سەبیلە و قەننە.

**ژارک** (دەر.): کۆلکی کەنگرییە.

**ژارەماسی** (کە.): کوچووڵە، ژەهرەماسی، مەرگەماسی، گیایەکە بەرزێک بڵند دەبێ گوڵێکی زەردی هەیە، ئەو گیایە لە ناو ئاودا گیرە دەکرێ یا بە کوتکی دەکوترێ و کەفێکی زۆر دەکات و هەر ماسیێکی بەو نزیکانەدا بێ دەیکوژێ یا بێهۆشی دەکات.

**ژارۆ** (دهۆ.): هەژار، بەلەنگاز. ـــ یی (باد.) هەژاری، بەلەنگازی.

**ژاروژەنگ:** زاروزەنگ، ئاڵەوهاوار، دەردو خەفەت، شەرکێشەی ژوورەوە، هەرا و هوریای نێوماڵێ.

**ژاری:** (باک.) هەژاری. نەخۆشی کۆنینە.

**ژارین** (باک.) هاوارکردن، لالانەوە.

**ژاژ** (کە.): ژاریلۆک، قامیشێکە پێنووسی لێ پەیدا دەبێ. قامیشەلان، قەرەم زەبەن. گیایەکی کوێستانییە دەکرێتە ناو سوورێرەکەوە.

**ژاژەلان** (ئەردە.): قامیشەلان.

**ژاژک** (دەر.): باوێشک. بنێشت، جاچک، جاچکە.

**ژاژکە:** جاجکە، بنێشت.

**ژاژی:** شیرێژی ووشک و تەڕ، ئەوانەش تێکەڵ بە ژاژی دەکرێن: بەرک، سیابۆ، مەندک، کەنگر، کوراده، سیر، زیزک، بۆک. شیرێکە لە پیستەدا بۆ زستانێ هەڵ دەگیرێت.

**ژاژیرۆن** (باک.): شیرێژ و ڕۆن.

**ژاژیلۆک** (کۆ.): ژاژ، گیایەکە وەکو قامیش وایە قەڵەمی لێپەیدا دەبێ.

**ژارغ** (باک.): گیایەکە.

**ژاکان:** چلسین، سیس و چرچبوون، (کۆ.) گەچران، گەچلان، (هەورا.) ژاکیای، چزمرین، دەق شکان.

**ژاکاندن:** سیساندن، چرچاندن، کرچانن، گەچراندن، گەچلاندن، بەیین، (باک.) چلمساندن، چرچ و سیسکردنی گیاو گوڵ و هەموو چتێکی شۆق و گەش، دەق شکاندن، ژاکانن.

**ژاکانن:** ژاکاندن.

**ژاکاو:** دەقشکاو، لە دەستەوەدراو، (باک.) قرنی (بۆ گیاوگوڵ)، گەچراو، قرمچ، (دەر.، ڕۆژ.) تلپ، گرژ، چرچ، سیس، چرچ و لۆچ لێپەیداکراو. نە ـــ : دەق نەشکاو.

**ژاکیاگ** (ئەردە.): ژاکاو، سیساگ، چرچ، گەچراو، کرچ، کرچیاگ، چرچیاگ، سیس.

**ژاکیان** (ئەردە.): ژاکان، سیسبوون، چرچبوون، سیسیان، چرچیان.

**ژاکیو** (ئەردە.): ژاکاو.

**ژاگە:** ژووژە سوورە.

**ژاڵ:** ژاژ.

**ژاڵە:** (ڕەوا.، کۆ.) لوورک، (هەو.، گەر.) ڕوولک، (زەن.، کەل.) خەرزاڵە، (دەر.) قرجێڵی، قرژێڵی، (باک.) ڕوول، قەژیەڵە، قرژاڵە، (ئەردە.) کەرکوژ. گەڵای تاڵە مریشک و مەڕاوی و قاز بیخۆن پێدەمرن دارەکەی بەقەد دارە قەیسییەکی لێدێ گوڵی سپییە و ئاڵیشی هەیە وەکو گوڵی گولاوییە، بەلام بە تۆپ نییە و وەکو فینجانی وایە، کەلوویەکی درێژی هەیە، دارەکەشی بەزۆری دەکرێت بە (کرە) ی ئاش و چەڵتووکی پێ کرە دەکرێت.

**ژان:** ئازار، دەرد، ئێش، ژووار، دەردێکە تووشی گیان لەبەران دێت سا لەبەر کولک و برین و قونێرانبێ یان بە هۆی نەخۆشیانی ژوورەوەی ناو لەش بێ. ـــ کردن: ئێشان. وە ـــ خستن: کولاندنەوە، ئێشاندن. (باک.) ـــ ی چاڤی، ژانی چاو، گل، ژانی مالات و ئاژالان: گرکە. چەقچەقۆک گیایەکە شیری هەیە شیرەکەی بە ژانگر تەو بدرێ ژانی دەشکێنێ، سۆتکە: گیایەکە لە قەراغ ئاوان و زیخمالان شین دەبێ و بنەکەی وەکوو دەنکی ناو خورما وایە ڕەگی زۆرە بەلان گیایەکە خۆی چکۆلەیە و کەم دێتە دەرێ، دەنکەکانی بە ووشکی و ووردکراوی بخورێن بۆ ووشکە ژان زۆر باشە ئەگەر بیکولێنن و ئاوەکەشی بخۆنەوە باشتریشە.

**ژانازراف:** (سل.) دەردەباریکە.

**ژانەزراف** (باک.): (سل.) دەردەباریکە.

**ژانەزگ:** زگ ئێشە.

**ژانەسەر:** سەرئێشە.

**ژانەسک:** زگ ئێشە.

**ژانەو گورچیلەی** (هەورا.): دەردی گورچیلە.

**ژان بژاردنەوە:** ژانێکی دەم دەمییە لە پێش منداڵبوونیدا بە چەند دەمێکی تووشی ئافرەتی ئاووس دەبێت.

**ژان پیاهاتن:** ژان پێداهاتن، ژانگرتن.

**ژاندار:** ئێشدار، پرئێش، تیرێش، ژانکردوو، ژانگرتوو. ـــ ی: ژانگرتن.

**ژانەس پێدان:** وەژانهاتن، ئێشان.

**ژانەن:** ژەنن، ژەندن، ژەنین، (هەورا.) ژنیای، کەیاندن.

**ژانکردن:** ژانگرتن.

**ژانکردوو:** ژانگرتوو، ژاندار.

**ژانگرتن:** ژانکردن.

**ژانگرتوو:** ژاندار.

**ژانلێهاتن:** ژانکردن، (هەورا.) ژانکردەی.

**ژان و برک:** ژان و دژووار.

**ژانی چاو:** گل.

**ژانی مالات و چوارپێیان:** گرکە.

**ژاوای** (هەورا.): جوون، جووین.

**ژاوە** (ئەردە.): فلتە.

**ژاوەرۆ:** پارچە خاکێکە. چۆمی خاوێن و پاک.

**ژاوەژاو:** دەنگەدەنگ، فلتەفلت، دەم بەیەکاهاتن.

**ژاوین** (هەورا.): جوون، جووین، بەددان جووین.

**ژەبەژ** (زا.): شوورتی.

**ژەحر** (زا.): ژەهر. (ئەردە.) ژەهراو.

**ژەرەژ** (هەورا.): کەو، چیل (باڵندە)، بەق.

**ژەرەژی** (هەورا.): کەو، جوورە باڵندەیەکە.

**ژەقنە:** زەقنە.

**ژەقنەبووت:** ژەقنەمووت، ژەقنی هەلاک، ڕەمێکی بۆر و چکۆلەیە دەنێو گیایاندا خۆی دەشارێتەوە مالات بیخوا پێی دەمرێ، بۆ جنێویش بەکاردەبرێ.

**ژەقنەمووت:** ژەقنەبووت.

**ژەقنەمووتکردن:** بە ژەهری مارکردن، واتە خواردن و خواردنەوەیەکە، کە سوودی لێنەبینی بەڵکو زیانی لێ ببینێ.

**ژەقنی هەلا:** ژەقنەمووت. بۆ جنێویش بەکاردەبرێ.

**ژەک:** (وان.) ژاک، (هەو.) شیری تەڕ، کەرە، (باد.) فرش، سەرەتای شیری گیان لەبەرانی مێ پێینەیە دووای زانیان تا سێ ڕۆژان.

**ژەم** (هەورا.): جار، چەل، نۆبە، ژەمەک. (بابا.) جەم، جارە نانخواردنێکە یا بەشێکی دیاری کراوە لە هەر چتێکی بێ. (کۆ.) مێشک. (ئەردە.) برسی، ژەمەن بگردگ، جەمبوور دوور.

**ژەمان** (ئەردە.): ژەمەن.

**ژەمەک:** ژەم، ئەندازەیێکە لە ماست، کە دانرابێ بۆ ژاندن.

**ژەمەن:** ڕۆنی کەرەی بەرە مەشکەیەکە، کە لەبەیەکی لە مەشکە دەربێت.

**ژەمەنە:** ژەمەن.

**ژەمەنبردە:** ژەمبوردە.

**ژەمەنبگردگ** (ئەردە.): ژەمەنبووردە.

**ژەمەنبووردە:** ژەمبووردوو، کەسێکە کاتی جەمەنانێکی بەسەردا ڕابردبێ و نەیخواردبێ، سا لەبەر کاروبار یا ناسازی.

**ژەمەنبووردوو:** ژەمبووردە، ژەمەنبووردە.

**ژەمبووردە:** ژەمەنبووردوو.

**ژەمبووردوو:** جەمبووردوو، جەم بەسەرچوو.

**ژەمەک:** ئەندازەیێکە لەماست، کە بۆ ژاندن ئامادەکرابێ.

**ژەن:** لێدەر، مرازی بکەرە و لە دووای هەندێ ووشەوە دێ: زوڕناژەن، بۆڕیەژەن.

**ژەنانن:** ژەنین. لێدان.

**ژەناوەردەی** (هەورا.): ژنهێنان.

**ژەناوی** (هەورا.): ژاندن.

**ژەن بەژەن** (هەورا.): ژن بەژن.

**ژەند:** پەرتووکی گەشتاسپییە.

**ژەندەن** (زمن.، کەل.): دروستکردن، (باک.) ژەندن.

**ژەندراو:** مەشکەی ژاندراو.

**ژەندن:** ژەنن، ژاندنی مەشکە و چتیتر، هێنان و بردنی ماستە لە نێو مەشکەدا بۆ گرتنی کەرەکەی. ئاژۆتن. هەڵپەڕین، ژنن. ژەنین، ژەنن. لێ ـــ: لێژەنین. داخستنی دەرکە و پەنجەرە و نیدیکەیە؛ دەرگایەکە بژەنە. کردنەوەی لۆکە و پەرەکردن. ئاوورکردنەوە بە بەرد و نستێ، کەڤاڤژەن، ئاڤژەن، پەرەکردن.

**ژەنگ:** پشی، ئازارێکە تووشی ڕووەکان بێ زیانیان پێدەگەیەنێ، کە تووشی میوەی بێ گەندی دەکات. کەتووشی گەنمی بێ، کە خۆلە گەلایەکانی بدات زیانی نییە بەلان، کە خۆلە گوڵەکانی بدات چرووکی دەکات، بە هۆی زۆر ئاودانی یا تێدا ڕاوەستانی ئاو ساهی زەوی بێ یا باراناو. خۆرک، خۆرکە، خۆسەرە، ژەنگار، خۆرە، ژنگار، خوورک، لە ئاسن و پۆلا و هەموو جوورە کانێکی دەدات و ڕەنگیشی سوورێکی تاڵە. ـــ گرتن: خوران.

**ژەنگار** (باک.): ژەنگ. (هەورا.) خڵتەی مۆدنە و سەبیلە و قەننە و باسقەننەو. (یەز.) دووکەڵ. مووڕووە شین، جووڕێکە لە زاخی شینکارەو بۆ زۆر چتان بەکاردەبرێ بە تایبەتی بۆ کرمی برینی ئاژاڵان. چیایەکی تەم و مژو دومانی لەسەر بێ یا پێوەبێ ـ ی پێدەڵێن. ڕەنگێکە لە نێوانی زەرد و سوور و ڕەشی دایە، سەوزێکی تۆخە. نێوی شارۆچکەیەکیە.

**ژەنگاری**: دانیشتووی ژەنگار. جووڕە هەنجیرێکی باشە.

**ژەنگاسن**: گووراسن، تۆفاڵ.

**ژەنگاڵ**: دانە، دانەی فەرەنگ. زەنگاڵ، وەکوو کاڵە وایە لە پێ دەکرێ. بەڵەک پێچ لە چەرمی و یا لە خوری و چتێکیتر، مووچ پێچ، مووس پێچ.

**ژەنگاڵی**: جووڕە هەنجیرێکی باشە. ڕەنگی ئاسمانی، ئاوی.

**ژەنگاوی**: زەنگارۆی، زەنگۆگرتی، ژەنگخوواردوو، کانێکە ژەنگی لێدابێ.

**ژەنگە سوورە**: (شن.، بابا.) شەنگەسوورە، (کۆ.) ژەنگەسۆرە، (هەورا.) سوورە پیاز، (شووا.) سوورەمزە، (بابا.) زەنگە زێرە، (باک.) زۆرک، مۆزسۆر، (ئەردە.) سوورەمۆزە، (لو.) زەردەواڵە.

**ژەنگقلیان**: خلتەی قەلیان.

**ژەنگلێدان**: ژەنگ کەوتنە سەرچت.

**ژەنگن**: چتی ژەنگاوی.

**ژەنگهاووروگ**: ژەنگاوی، ژەنگاوین.

**ژەنگهاووردن**: ژەنگهێنان.

**ژەنگهەڵێنان**: ژەنگلێدان.

**ژەنگهێنان**: ژەنگهەڵێنان.

**ژەنگیت** (کرما.): برۆ.

**ژەنن**: ژەندن، داخستن، پێوەدان، بەستن، قایم کردن، قوڵفکردن. ژاندنی مەشکە و ئیتر، شلەقاندن. دروستکردن، ڕێکخستن.

**ژەنن بەئاوا** (ئەردە.): لە ئاو هەڵکێشان.

**ژەنوو** (باک.): ئەژنۆ، چۆک.

**ژەن و کلفەت** (هەورا.): ژن و خێزان.

**ژەنی** (هەورا.): ژن، ئافرەت.

**ژەنیای** (هەورا.): ژەندن.

**ژەنیک** (باک.): پارچە، ئاستەم، (دزە.) توسقاڵ.

**ژەنین**: ئاژۆتن، لێخوڕین. تێڕاکردن، لێژەنین، وەبەرحینچکاندن، وەبەر حینچکاندان. ژەندن. پرشکی ئاوری. داخستنی دەرگا و پەنجەرە. هەڵپەڕین.

**ژەه**: ژێ، ژیێ، هی کەوان و تار و ساز و ئیدی.

**ژەهر**: ژار، میناک، ئاغوو، ژەحر، ئەو ئاوە کوژندەیە، کە مار بە گەزتن و دووپشک و ژەنگە سوورە و ئیتر بە چزوو لە لەشی گیان لەبەرانی دەکەن. توورەکەی ـ : دلۆق.

**ژەهراو**: ژاراو. ـ ی: ژاراوی.

**ژەهرەمار**: ژەهری مار. بۆ جنێویش بەکاردەبرێ.

**ژەهرەماسی**: ژەهرماسی.

**ژەهردار**: ژەهرین، زەهردار. ـ ی: ژەهراوی.

**ژەهرک** (باک.): نەخۆشی.

**ژەهر کەنگر**: جیوەیێکی ڕەشە بنی کەنگری دووای ووشک بوونی کەنگرەکە دەری دەکات، کەوچکێکی لێ بخوری بۆ ڕەوانی باشە و پێش بەرشانەوەش دەگرێ.

**ژەهرماسی**: ژارماسی، ژەهرێکە تێکەڵ بە هەویری دەکرێ بۆ ماسیان.

**ژەهری** (باک.): نەخۆشی.

**ژەهرین** (باک.): ژەهردار.

**ژێر** (زا.): لەباتی.

**ژێرناخفتن** (باد.): وورڕێنەکردن، قسە بزرکاندن.

**ژێرکردن** (باد.): لەبەرکردن.

**ژێش** (باد.): کاڵەک.

**ژێل** (باد.): بێجگە، جگە، بێ لە.

**ژێو** (باک.): لەبەر، لەبۆ.

**ژێونا** (باک.): لەبەر، لەبەردڵ. ـ تە: لەبەردڵی تۆ.

**ژبیرکرن** (باد.): لە بیرچوون.

**ژ ـ ژژۆ** (باک.): ژووشک، ژووژک.

**ژژۆ** (باک.): ژووژک.

**ژوو** (باد.): ژووژک.

**ژڤژی** (شکا.، نەه.): ژووژک.

**ژلک** (بابا.): گیایەکە وە کوڕادەی دەچێ بنەکەی وەکو کیفۆکی وایە.

**ژلووق**: شلووق.

**ژلووقاندن**: شێواندنی شووێنێک، پەشێوی تێخستن.

**ژلووقانن** (ئەردە.): ژلووقاندن، شلووق کردن.

**ژلووقاو** (ئەردە.): ژلووقیاگ.

**ژلووقیاگ** (ئەردە.): ژلووقاو، شلووق، ژلیویاگ.

**ژلووقیان**: شڵەقان، شڵەژان، شلووق بوون.

**ژلیقان** (ئەردە.): شڵەژان.

**ژلیقانن** (ئەردە.): ژلووقانن، تلیقانن، فلیقانن، فلیقاندنەوە.

**ژلیقیاگ** (ئەردە.): ژلووقیاگ، تلقیاگ، شکیاگ.

**ژلیقیان** (ئەردە.): شڵەقان، شڵەژان، فلیقانەوە، جیق دەرهاتنی ترێ و چتیتر.

**ژلیوان**: ژڵیویان.

**ژلیوانن** (ئەردە.): شێواندن، ژلووقانن، شلووقانن.

**ژلیوە** (ئەردە.): شێواوی، پەشێوی، شێویان.

**ژلیوەژلیو** (ئەردە.): ژڵیوە.

**ژلیویان**: شێوان، تێکچوون، شێویان، شلووقیان، شووریان.

**ژلێوکێ** (هەورا.): گەڕۆک، جووڵەجووڵکار.

**ژمار**: ئەژمار، ژومار، ژمارە. لە ـ نایەت: نایەتە ئەژماردن.

**ژمارای** (هەورا.): ئەژماردن، ژماردن.

**ژماره:** ژوماره، ئەژماره.

**ژمارەگر:** ژماریار. ـــ ی: ژماریاری، بەسەرکردنەوەی ژمارەی هەر چتێکی بێ.

**ژمارتن** (باک.): ئەژماردن، هەژمارتن، هەژماردن، ژماردن.

**ژمارده:** ئەژمارده، ژوماره، چتی هەڵبژێرراو، ئەژمێرراو.

**ژماردەی** (هەورا.): ئەژماردن.

**ژماردن:** ئەژماردن، هەژماردن، ژوماردن.

**ژماریار:** ژمارەگر، کەسێکە پیشەی هەر ئەژماردن بێ.

**ژمێر:** ئەژمێر.

**ژمێراو:** ئەژمێراو.

**ژمێره:** ژماره.

**ژن:** ڕەنگە کورتکراوەوەی (ژین) بێ چونکوو ئافرەت: هاوسەری ژیانی مرۆیە، ئافرەتێکە شووی کردبێ ئەوسا مێردی مابێ یا بێوەژنبێ، هامخەر، هارخەف، (ئەردە.) جفت، ژنک، (باک.) پت، پتکۆ، (هەورا.) ژەنی. ـــ هێنان: داخوازی کردن، ژنخوازتن، خوازبێنی کردن. ـــ ی مارەکراو: ژنکا پشت لەمردی. ـــ ی بە مێرد: خێزان. بێ ـــ: ڕەبەن، (باک.) ڕەبەنۆک.

**ژن ئاپ** (باک.): ئامۆژن، ژئام.

**ژناغا** (باک.): ئاغاژن.

**ژن ئاغه:** ئاغاژن.

**ژنانه:** وەکوو ژنان، شێوە و ئاکار و کردارێکە، کە تەنها لە ژنان بوەشێتەوە، ژنانیلە.

**ژنانی:** ژنانیلە، پۆپن.

**ژنانیله:** ژنانە، ژنانی، پۆپن، مێیانە، مەییک، نێرینەیەکە، کە کردار و خووی لە ژنان بچێ.

**ژنەوژن** (ئەردە.): ژن بە ژن، ژنوازن.

**ژنەبی** (باک.): بێوەژن.

**ژنەڕەنگه:** بلە کناچێ، ژنانیلە.

**ژنەفتن** (هەورا.، زمن.): بیستنی بە گووێ، ژنەوین، ئەژنەفتن.

**ژنەکچ** (ئەردە.): کچێکە لە پێش خۆناسینیدا شووی کردبێ.

**ژنەمێر** (باک.) ژنێکە ڕەووشت و کرداری وەکوو مێران وابێ.

**ژنەوا:** کەسێکە گوێی سووکبێ و باش ببیستێ، (هەورا.) بیستەر، بیسەر، ئەژنەوا. نەـــ: گووێ نەگر، گۆشنەگر.

**ژنەوای** (هەورا.): بیستن بەگووێ. ئەژنەوای: نەبیستن، گووێ لێنەگرتن.

**ژنەوایی:** بیستن، ئەژنەوایی.

**ژنەوتن** (ئەردە.): بیستن، ژنەفتن.

**ژنەویاگ:** بیستراو، ژنەفتی.

**ژنەوین** (ئەردە.): بیستن بە گووێ، ژنەفتن.

**ژنەب** (فە.): ژنباف، زڕدایک.

**ژنباز:** ژنپەرست، مێباز. ـــ ی: ژنپەرستی.

**ژنباف** (باک.): باوەژن، زڕدایک.

**ژنبەژن:** ژن (کچ) دان بە کەسێکی لە بەرانبەر کچ لێخوازتنی، (ئەردە.) ژنوازن، ژناوژن.

**ژن بەمەز** (ئەردە.): ژنحیز، قووڕمساغ، گەواد، قەڵتە.

**ژنبرا** (باک.): براژن.

**ژنبی** (باک.): بێوەژن، ژنەبی.

**ژنپەرست:** ژنباز، چاونز، دلبژۆک، دلپارسک، کەسێکە زۆر حەز لە ژنان بکات. ـــ ی: چاونزی، دلپارسکی، ژنبازی.

**ژنتی** (باک.): ژنی برای مێردی.

**ژنحیز:** گەواد، تەرەس. ـــ ی: گەوادی، تەرەسی.

**ژنخال** (باک.): خاڵۆژن.

**ژنخوواز:** (هەکا.) ژنڤیان.

**ژنخووازتن:** ژنخوواستن.

**ژنخووازی:** خوازبێنی کردن.

**ژنخوواستن:** داخووازی کردن.

**ژنخووەیشک:** ژنخوشک.

**ژنخوشک:** ژنخووشکە، ژنخووێشک، گۆرم، خوشکی ژن.

**ژنخووێشک:** ژنخوشک.

**ژندار:** بە ژن. ـــ ی: بە ژنی.

**ژن سەیدا:** مامۆستاژن.

**ژنڤیان** (هەکا.): ژنخوواز. ـــ ی: ژنخووازی.

**ژنک** (باک.): ژنەکە، تیپی (ک) لێرەدا مرازی ناسیاریە وەکوو (کە): ژنەکە.

**ژنکۆک** (باک.): ژنوکە، پارچەی (کۆک) مرازی گچکەکاری بەمەبەس لە ژنێکی گچکۆکەیە.

**ژنگرتی** (باک.): شایانی ژیان.

**ژنمام** (باک.): ئامۆژن.

**ژنمردگ** (ئەردە.): ژنمردوو.

**ژنمێر** (باک.): شاژن.

**ژنۆ** (باک.): ئەژنۆ.

**ژنوازن** (ئەردە.): ژن بەژن.

**ژن و ژنخووازی:** ژن لێک خووازتنی دوومالێ یا دووتیرە.

**ژن و منداڵ:** خێزان.

**ژنهاووردن:** ژنهێنان.

**ژنهێنان:** ژنهاووردن، خووازبێنی کردن، داخووازی کردن و مارە کردنی ژن و گووازتنەوەی بۆ کابانی.

**ژنێ:** لەکاتی بانگکردنی ئافرەتێکیدا بەکاردەبرێ.

**ژنی:** ئافرەتێتی.

**ژنیاگ** (ئەردە.): ژەنراو، شڵەقاو. (ئەردە.) بەستراو، داخراو، پێوەدراو.

**ژنیان** (ئەردە.): بەستران، پێوەدران. ژەنران، شڵەقان.

**ژنیای** (هەورا.): ژاندن. ژنهێنان.

**ژنیەن** (هەورا.): بیستن.

**ژنیەی** (هەورا.): بیستن.

**ژنێتی**: (باک.) ژنینی، ژیربوون و دەرهاتەی ئافرەت.

**ژنی بۆگەن**: بۆگەنکە، ژنێکە بۆدڕنێ لیێبێ.

**ژنی مارەکراو**: ژنکاپشت لئەردی.

**ژنی بەمێرد**: خێزان.

**ژنینی** (باک.): ژنێتی.

**ژۆ** (باک.): بۆ، لەبۆ.

**ژۆر**: لای ژووروو، ژوور، (باک.) لای سەروو، سەرەوە، بڵند، هەوراز، ژووروو، ڕاژۆر. ـــ ی سەری: لای سەرێ. ـــ وژێر ئانین: لێکۆڵینەوە، هێنان و بردن، بەر بژۆر چوون: سەرکەوتن، چوونەسەر.

**ژۆرڤەچوو** (باک.): بە فیز، بەهەوا.

**ژۆرڤەچوون** (باک.): بەفیز و بەهەوابوون.

**ژۆروژێر** (باک.): لەسەریەک، پێکەوە.

**ژۆرین**: لای ژوورووی چت، بڵندی، وەڵاتی ـــ: وڵاتی سەرەوە.

**ژۆژۆ** (هەورا.): ژووژک.

**ژۆژی** (باک.): ژووژک.

**ژۆلوقانن**: ژلوقانن.

**ژومار**: ژمار.

**ژومارە**: ژمارە.

**ژوماردە**: ژماردە.

**ژوماردن**: ژماردن.

**ژوو**: کورتکراوەی ژوورە. ـــ ا پێڤە: لەگەڵ ئەوەش. ـــ ا پاشی: لەوە پاشیش. ـــ ا رەڤە: لە ناوەوەدا.

**ژووار** (کۆ.، رەوا.): ژان، ئێش.

**ژووان**: بەڵێن، پەیمان، بە دزی یەکتر دیتنی دوو دڵدارانە.

**ژووانگە**: شوێنێکی تایبەتی دیاری کراوی نهێنییە بۆ ئەوەی یار و دڵداران یەکتری تێدا ببینن، جێ ژووان، جەپەرگین.

**ژووپێڤە** (باک.): سەرەرای ئەوەش، لەگەڵ ئەوەش.

**ژوور**: دیو، ژۆر، وەتاخ، چاوە، هۆدە. ناو، نێو، ناوەوە، ژوورەوە، (هەورا.) دوڕ، دڵێ، نێوخانوو، نێووەتاخ، نێوحەوش، بەرەو ـــ: ڕوویەڕووی چاوە خانوو. (ئەردە.) ئەوراز، چووەر، بڵند، لای سەرەوە، هەوراز، بان، لای ـــ: لای سەرەوە، لای ژووروو، ڕاژۆر. (باک.) سەروز، شین. (زا.) بەرسیلە، قۆرە.

**ژووران**: کاتی چوونە ژوورەوەیە لە سەرمان.

**ژوورەوە**: لای بنەبانی، لای هەرەسەروو.

**ژوورسەر**: لای سەروو.

**ژوورک**: سەرک، بانگ، لای سەروو.

**ژوورگ**: ژووروو، ژوورگین.

**ژوورگین**: ژووروو، ژوورگ.

**ژوورنگ**: ژووروو.

**ژووروو**: لای هەرە بەروژوورە.

**ژووروو ئەدۆوەنەی** (هەورا.): ژووری خوێندنەوەی.

**ژووری**: ژوورەوەی چت. بچۆرە ـــ: برۆ ژوور.

**ژووری ئاووردوو**: چیلیان. دیوی ئاووردوو.

**ژووری دانەوێڵە**: کەوار، ئەنبار، کیلێل، کیلێر.

**ژووری دانیشتن**: دلێ ئەرەنیشتەی، وەتاخ.

**ژووری میوانداری**: قۆچکی.

**ژووری نوستن**: خاوگە، خەوگە، نوستنگە. نڤینۆک. (هەورا.) ژووروو ووتەی.

**ژووژانن** (ئەردە.): حەساندنەوە.

**ژووژک**: ژیژک، ژووژ، ژیژی، ژیشک، (شکا.) ژووژی، ژۆژی، ژووژوو، ژژۆ، ژژوو، کودژ، ژیژوو. گیاندارێکی خڕنی دڕوواویە گۆشتی دەخورێ و مار خۆرە قەپ لەمارەدەگرێ وخۆی دەکاتە گلۆڵە مارەکە زۆر خۆی پێدادەدا تاورنجر بەورنجر دەبێ. گۆشتی بۆ سووزەنەکدار باشە پێستیشی بۆنەمژینی جووانەو گوێرە بەلموزیانەوە دەبەستری لەمرووی ئەوەوە، کە لەکاتی مژینی دا درکەکانی لەگووانی ماین ومانگاکە ڕادەچێ نایەڵن بیانمژن.

**ژووژوو** (باک.، بار.): ژووژک.

**ژووژی** (بۆ.، شکا.): ژووشک.

**ژووژیان** (ئەردە.): حەسانەوە. ـــ ەوە: حەسانەوە.

**ژووژک**: ژیشک.

**ژووڤان** (باک.): پەشیمان. ـــ ی: پەشیمانی

**ژووڵان**: جووڵان.

**ژووڵە** (ئەردە.): جووڵە، هووژە، ژڵیوە.

**ژووڵیاگ** (ئەردە.): چتی ژاکاوی تێکەڵ وپێکەڵ، کژیاگ، پەژیو.

**ژووڵیان** (ئەردە.): تێکچوون ودەقشکانی چت، کژیان، پەژیویان، شێوان.

**ژووم** (باک.): کات، سەردەم، دەم، چاخ، گاڤ.

**ژە** (باک.): یاڵ.

**ژەهڤبەر** (باد.): بەرانبەر.

**ژێ**: دەنگی تیپی (ژ) یە کە، تیپێکی (تایبێ) کوردییە. ناوی خێڵێکی زۆر گەورەی کوردە، کە کرمانجیشیان پێدەڵێن وەکو براکوردەکانی بادینان و باکوور وکردی وورمێ و ئازەربایجانی ڕووسیەش. بۆ تێلی تار و ساز و عودیش بەکاردەبرێ. (باک.) ژیی، ژەه. ژێ ی کەوانی: ژیی کەمان. ڕیخۆڵەی ووشک بادراوە، کە دەکرێ بە کەوانی پەرەکەرانەوە و بەدرێژی پێیەوە دەبەسترێ. (باک.) کورتکراوەی ژێ یە.

**ژێبۆ**: کرمانج، ژێ، لۆلۆ، ژێ بەکوردانی باکوور و زاراوەی ئاخافتنیان دەڵێن.

**ژێبەردان** (باک.): بەرەڵاکردن، تەڵاقدان.

**ژێبەردایی**: بەرەڵاکراو، تەڵاقدراو.

**ژێخارن:** لێخواردن.

**ژێخاری:** لێخوراو.

**ژێخووارنی** (باک.): لێخواردن.

**ژێخوواری:** لێخوراو.

**ژێدانەدەر** (باک.): پێدرکاندن، لێدەرخستن، ددان پێدانان: مـن لێخست ژێدادەر: ئەمن لێمدا و پێمدرکاند.

**ژێدەر** (باک.): سەرچاوە، سەرچاوگە، چاوگە.

**ژێدزین** (باک.):لێدزین.

**ژێر:** بن، خووارەوە، بنـەوە، بنـەوەی چت، (هـەورا.) تـەرک، چێر. ـــ کەوتن: بنکەوتن. چوونە ـــ: (زمن. کـەل.) درکـاندن، ئاشکراکردن، خستنەملی خۆ، چوونە ژێربـاری فـەرمانی ئـەم وئـەوەوە. بۆخـاکێک بـەکاردەبرێ، کـەنزم بـێ، ئـەو ـــ ە: مەبـەس لـەخاکی گەرمێنییـە. سەربەسەربوون: سەرەوژێر بوون، چوونەخووار. (هەورا.) ژێر بزێوێکـی وایە ( ِ ) لەژێرهەندێ پیتی ئارەوی دادەنرێ وەکوو: لِواء. بەئارەوی: (کسرة، جرّة) ی پێدەڵێن. خووارەوە.

**ژێرپا:** ژێللا ژێرا، لای خووارەوە. لە ـــ هات: لەژێللاهات.

**ژێراف:** درووگە.

**ژێرئاگرە:** بن ئاگرە.

**ژێراو:** جۆگەیێکی سەرداپۆشراوە ئاوی پیسی پێدا بڕوات.

**ژێراو چوون:** (ئەردە.) قوڵتیان بەئاوا.

**ژێراوی:** ژێردەریایی.

**ژێرنیستێکان:** ناڵبەکی، تەبڵە، ژێرپیاڵە.

**ژێرە** (ئەردە.): خوواری.

**ژێرەخەر:** ژێرڕاخەر، ڕاییێخ، ڕایەخ.

**ژێرەوە:** خووارەوە، بنەوە.

**ژێرەبووگ:** وەژێرکەوتن.

**ژێرەوژوور:** سەرەوژێر. ـــ بوون: وێران وکـاول بـوون وسـەرەوژێر بوونـی خانوو یا ئاواییێک.

**ژێرەوکردن** (ئەردە.): شاردنەوە، پەنهانکردن.

**ژێربال:** ژێرپەر، لەژێر چاوەدێری.

**ژێربالخستن:** بریتییە لەدەست بەسەر یەکێکی داگرتن و پەنادانی.

**ژێربەران:** ئاستانە، بەردەرگا، ئاسانە.

**ژێربەرەوژوور:** چاوێکە لـەبـەر بـێ هۆشبوونێ ڕەشـکێنەکەی بـەرەوژوور چووبێ.

**ژێرپاکردن:** پامالکردن، پایمالکردن.

**ژێرپێ:** پێ پەست. بەری پێ.

**ژێرپیاڵە:** ناڵبەکی، ژێرنیستکان.

**ژێرجام:** دەورێکە جامی لەسەردادەنرێ.

**ژێرجغارە:** تەپسی، ژێرسیغار.

**ژێرجلەکی** (ئەردە.): مەبەس لە چتی پەنهانییە ، نهێنی، داپۆشراو.

**ژێرچەپۆکە:** مەبەس لەکەسێکییە، کە لەژێردەستی زۆرداریکی دابێ.

**ژێرچەم** (ئەردە.): هاوپشتە، بەبڕەو، لەمەڕ.

**ژێرچەناگە:** ژێرچەنە.

**ژێرچەنە** (کۆ.): چێشتێکە لـەزمان و ڕیژچەنەگـە بـە شـۆرباو دروست دەکـرێ و جارجـارەش برنجـی تێدەکـرێ. جەناخـە،(ڕەوا.) بەربەنـە، قەمچولـە.(هـەورا.) ژێرچەناگـە، جناخـە، مـووروی هۆنـراوەوە یـا قەیتانێکـە ژنـان دەیخەنـە ژێرچەنەیانـەوە تـا کڵاوەکـەیان دانـەماڵێ . بنگەردن.

**ژێرچناگە** (ئەردە.): ژێرچەنە، ژێرچەنەگە.

**ژێرچناگەدان:** لەژێرچەنەگەدان.

**ژێرچناگەی کەڵەشێر:** دووپەلکەکانی ژێر چەنەگەی کەڵەباببییە.

**ژێرخاکەوکردن** (ئەردە.): بەخاک ئەسپاردن، خستنە ژێرخاک.

**ژێرخان:** (دەر.) بن زەمـین، ژێری خێن، ژێرزەوین، سـەرداو، سـارداو. نهۆمی هەرەخووارەوەیە لە خانوو.

**ژێرخستن:** وەژێرخستن، قەرزدارکردنی یەکێک یا زەبوونکردنی کەسێکی یان زیان پێگەیاندنی.

**ژێرخووان:** خوانکە.

**ژێردار:** مرازێک یان کەل وپەلێکە ژێر و بنکی هەبێ. (هەو.) مرازێکە لە کەرستەی جووتی. پیتێکە لەزووانی ئارەوی دا، کەژێر (کسرە) ی هەبێ.

**ژێردەرگا:** ژێردەرگانە.

**ژێردرگانە:** ژێردەرگا، دارەکەی بندەرگایە، کە گرێنەی لێ هەڵدەکەنرێ.

**ژێردەریایی:** جوورە گەمییەکی جەنگییە بە بندەریایەدا دەڕوات.

**ژێردەس:** ژێردەست.

**ژێردەسە:** ژێردەست، دارودەسە، تابوون.

**ژێردەست:** نۆکەر، بندەست، بەردەست، (هەورا.) ژێردەستە، هێنانە ـــ: خستنە ژێرفەرمان، پەتک کردن.

**ژێردەستە:** ژێردەست.

**ژێردەستی:** نۆکەری، بندەستی، بەردەستی، نۆکەرایەتی.

**ژێردەسی:** ژێردەستی.

**ژێرڕاخەر:** پارچە چتێکە لە بن مافوورە و بەڕە و لباد یا دۆشەگ ڕاخرێ و یا بۆ لەسەر دانیشتنی ڕاخرێ، ژێر ڕاییێخ.

**ژێرڕاییێخ:** ژێر ڕاخەر.

**ژێرڕەخەر:** ڕاییێخ، ژێر ڕاییێخ.

**ژێرزەمین:** ژێرزەوین، سارداو، سـەرداو، (هـەورا.) زاخۆن، ژوورێکە لـە ژێر زەویدا دروست کرابێ.

**ژێرزەوین** (فە.): سارداو، سەرداو، (هەورا.) زاخۆن، ژێرزەمین.

**ژێرزەویی:** ژێرزەوی، سەرداو، ژێرزەمین، سەیزان، زەیسان، سارداو.

**ژێر زرانی** (ئەردە.): بن ئەژنۆ، ژێرچۆک.

**ژێر زریایی:** ژێردەریایی.

**ژێرسەر:** ژوورسەر.

**ژێرکەوتن:** وەبنکەوتن.

**ژێرسیگار:** تەپسی، ژێرجغارە.

**ژێر زکەووس** (ئەردە.): ژێرپا، پامال.

**ژێرزمان**: ژێر زووان، بەرتیل.

**ژێرزووان** (ئەردە.): بەرتیل، ژێرزمان، دارا ژێرزووانی بایزی ناگە: دارا بەرتیلی داوە بە بایبزی.

**ژێرزووان چەژتن**: زمان تاقیکردنەوە، زووان تاقیوکردن.

**ژێرزین**: لباد یا پەتوویە، کە لە ژێرزین و لەسەر پشتی وولاغ دادەنرێ.

**ژێرسەر**: بنسەر.

**ژێرسەماوەر**: خشت یا چتێکی دیکەیە لەژێر سەماوەری دادەنرێ.

**ژێرقلیان**: بەرقلیان.

**ژێرقلیانی** (ئەردە.): بەرقلیانی، خۆراکێکە بەیانیان لە ناشتادەخورێ، بەردل.

**ژێرک**: لای ژووروو، سەروو ژووروو.

**ژێرکە**: ژیشک.

**ژێرکەفتن**: ژێرکەوتن.

**ژێرکەن** (ئەردە.): لادرکە، کەوەرک، قەڵەشتی بنبەرد.

**ژێرکەوتن**: ژێرکەفتن، مەبەس لە قەرزداری و زەبوونی و شکستی یەکێک یا چتێکییە.

**ژێرکەوش**: بنسۆل.

**ژێرکراس**: کراسێکی کورتی بێ قۆڵە منداڵ و ئافرەتان لە بن کراسیەوە لەبەری دەکەن.

**ژێرکۆڵ** (ئەردە.): شێرکۆڵ، بەچکەی شێر.

**ژێرکێرە**: ژێردەستێکی سووکە.

**ژێرگ**: ژێروو، ژێری، ژێرین، تەکین.

**ژێرگین** (ئەردە.): ژێروو، ژێرگ.

**ژێرلچەکی** (ئەردە.): چپەکردن، پچە، سرتە.

**ژێرلچەکین** (ئەردە.): زەردە، زەردەخەنە.

**ژێرلچەوکین** (ئەردە.): زەردە، زەردەخەنە.

**ژێرماڵە**: ماڵێکی لە یەکدوو چاوەی خانووێکی دا، کە ژوورەکانی تریشی خاوەند ماڵی تێدابێ.

**ژێرۆ** (باک.): باشوور.

**ژێرووژوور**: سەرەوخوار.

**ژێرهار**: ژێرسەنگ.

**ژێری**: بڕوانە: ژێرین.

**ژێری خێنی** (باک.): ژێرخان، سەرداو، سارداو.

**ژێرین**: لای ژێرەوە، لای خوارەوە، ژێرگین.

**ژێستاندن** (باک.): لێ ئەستاندن.

**ژێشقەتاندن** (باک.): لێجووێ بوونەوە، ژێ جهێ بوونەوە.

**ژێکرن** (شکا.): بڕین، سەر ـــ : سەربڕین.

**ژێکری**: بڕاو، سەربڕاو.

**ژێکرین** (باک.): لێکرین.

**ژێکڤە** (باک.): لەیەکەوە.

**ژێل** (ئەردە.): گوڵی قۆرەیە، کە لەکاتی ڕشانەوەی دا هەڵدەوەرێ.

**ژێلا**: ژێرپا: لە خووارەوە، لە ـــ هات: لە ژێرڕاهات، لە خووارەوە هات.

**ژێلەمۆ**: زیلەمۆ.

**ژێلی** (هەورا.): زیلەمۆ. (باک.) لەماوەی، لەکاتی، لەدەمی.

**ژێمایی**: پاشماک، شرە، میرات.

**ژێن**: ڕاژێن، هەژێن، هەژێنەر.

**ژێهاتن** (باک.): لێهاتن، لێوەشانەوە. ڕاهاتن، قالبوون.

**ژێهاتی** (باک.): ڕاهاتوو، قاڵ، دەرهاتوو، کاربین.

**ژیی** (باک.): ژێ، ژەه.

**ژی** (باک.): ژیان، بژیو، ژیوار، زیندەگانی.

**ژیار** (زا.): ژیان، ژینیار. (باک.) زیندوو، هۆشیار.

**ژیان**: ژیار، مافی گیانداره لە ژیاندا، ژین لە جیهاندا، زیندەگانی گوزەرانکردن. (ئەردە.) نرخ، هێنان.

**ژیانەوە**: ئەژین، بووژانەوە، ژانەوە، تازە بوونەوەی هەندێ چت دووای تێنوویتی یا کزی و زەبوونی و برسێتی.

**ژیاندار**: زیندوو، گیان لەبەر، گیاندار. ـــ ی: زیندوویی، گیانداری.

**ژیاندن**: ڕەنێو هێنان، بووژاندنەوە، بە خێوکردن، گوزەراندن.

**ژیاندنەوە**: ئەژاندن، ژاندن، بووژاندنەوە.

**ژیانن**: ژیاندن، گوزەراندن.

**ژیانی**: ژیاندەر.

**ژیبوون** (ئەردە.): جووێ بوونەوە.

**ژیدەرکەفتن** (باد.): ڕابووردنی کارێک، ژیدەرکەفت: ڕابرد.

**ژیدریژ** (باد.): تەمەندرێژ.

**ژیر**: هۆشیار، هیر، ژیرلۆ، هۆشمەند، ژیللە، مامۆتک، تێگەییشتوو، فامیدە. نێوی نێرینانە. ئاشت، مناڵێکە نەگری. ـــ بوونەوە: ئاشتبوونەوە، واز لە گریان هێنان، دامرکان، دامرکانەوە (بۆ منداڵە). ـــ کردنەوە: ئاشتکردنەوە، گریان لە بیر بردنەوە، دامرکاندن.

**ژیرا** (هەورا.): ژیر، هۆشیار، زیرەک.

**ژیرەوبوون** (ئەردە.): ژیربوونەوە، ئارام گرتن.

**ژیرەوکردن** (ئەردە.): ژیرکردنەوە، ئارام کردنەوە.

**ژیربوونەوە**: واز لە گریان هێنانی منداڵ و ئارام و کپبوونی.

**ژیرک**: ڕابەر، پێشەوا، زرنگ، زیرەک. (باد.) ژووروو، لای سەروو، لای ژووروو و سەروو.

**ژیرکەڵە**: (باک.) شیرکەڵە، خۆشەویست، چکۆڵە و جووان، منداڵی ژیری جووانکیلە، ژیکەڵە، (باک.) ئۆفلاز. ووریا، ئازا.

**ژیرکردن**: بێدەنگ کردنی منداڵ لە گریان.

**ژیرکردنەوە**: ئاشتکردنەوە، داکاساندن، دامرکاندن، واز پێ لە گریان هێنانی منداڵ.

**ژیرگی** (باک.): (باک.) ژیلی.

**ژیرلۆ**: ژیر، ژیللە، هۆشمەند، مامۆتک.

**ژیری:** هۆش، ژیللی، تێگەییشتن، وورییایی.

**ژیزوو:** ژوروژک.

**ژیزی:** ژوروژک.

**ژیشک:** ژوروشک.

**ژیڤان** (باد.): پەشیمان. چایچی. (هەورا.) ژیان.

**ژیڤانی** (باد.): پەشیمانی.

**ژیڤای** (هەورا.): ژیان.

**ژیڤنای** (هەورا.): ژیاندن.

**ژیکەڵە:** خشکۆک، خوشکۆک، خەمشۆک، هەبیڤ، خشتیلە، قشتیلە، قشت، جوان، پت، پتۆ، پتکۆ، لە (ژیرکەڵە)وە کورتکراوەتەوە، لەسەرملان سووک، ڕەزاسووک، ژیرێکی گچکە، ژیرکەڵە.

**ژیکەمان** (هەورا.): ژنێ ی کەوان.

**ژیگیر:** ئەنگوستیلە.

**ژیل** (شارە.): ژیلەمر، زیلەمۆ، ئاورێکە بوویێتە خۆڵەمێش بەڵان زیلەموی تێدا مابێ. (زەن.) شلێوە.

**ژیڵ:** ژیل. گوڵی ووردی بەرسیلەیە، کە هەڵی ئەپێچابێ و وەری بێتە سەر زەوی.

**ژیلافە:** شیلافە.

**ژیلاووک** (شا.): شیلاورک، پارچەیێکی لەوچ لۆچدارە لەناو زگی گیانداریدا و پڕە لە پیسایی.

**ژیلە مڕ:** ژیلەمۆ.

**ژیلەمۆ** (هەورا.، کە.): زیلەمۆ.

**ژیلە مۆ:** ژیلە مڕ، ژیل، ئاورێکە بوویێتە خۆڵەمێش بەڵان پۆولەوی ووردەی لەنێو دامابێ، ژیلەمۆ.

**ژیلک:** شیلاورک.

**ژیلە** (هەورا.): هۆشمەند، ژیر.

**ژین:** ڕۆژنامەیێکی کووردییە لە سلیمانی دەرچووە. ژیان، ساغی، ساخی.

**ژیندار:** زیندوو، خاوەند ژیان. (باک.)

**ژینداری:** ژیان، ژین.

**ژین و ژار** (باد.): ژیانێکی تاڵ و ناخۆش.

**ژینگاری:** زیندەگانی، ژیانی بە کۆمەڵ.

**ژینهار:** بۆ هەموو چتێک بەکاردەبرێ، کە مایەی سەخڵەتی و ئازاری ئادەمیزاد بێ.

**ژیوار** (هەورا.): نێوی دێیەکیە لە هەورامان. بار، چلۆنی، کوویی. (ئەردە.) گوزەران و ژیان.

**ژیوان** (شا.): پەشیمان، پاشگەز.

**ژیوانی:** پەشیمانی، پاشگەزی.

**ژیوای** (هەورا.): ژیان، تەمەن.

**ژیونای** (هەورا.): ژیاندن.

# س

**س:** تیپێکی ئابێی کوردییە.

**سا:** (ئەردە.) خاوێن، پاک. ئیتر، کەوایە، ئەوجا، ئەوجار، ئەوددەمی، دەسا، ئینجا، دەیسا، دە، سادەی. کەوایە: کە یەکێک بەندیواریت لە گەڵ بپسێنێ تۆش دەڵێی: سامنیش ناتناسم، جا، ئیتر، ئیدی. کە وای لێهات. (فە.) سێبەر، نیسێ، سایە. دڵسۆزی، میهرەبانی، لە ی تووە کارەکەم پێکهات. (باک.) ئاوا، ڕەنگ، جوور، وا، وەسا: بەورەنگە، بەوجوورە، ئاو. کات، دەم، گاڤ، ئەوسا، لەوساوە، ئیسا. (هەورا.) سایەقە، سار، ساماڵ. لە (وەستاو مامۆستا) وە کورتکراوەتەوە.

**سابات:** کەپری هاوینی، ئاوباخ و باخچەو سەوزیخانەو ئیترە، تەنها بۆ سێبەرە.

**ساباتی:** شان و شکۆی دەوڵەتی.

**ساباق:** شوورێنی گەورەی ووڕاقی بەربەرەڵایە.

**سابربەگی** (هەو.): جوورێکە لە سێ بابەتەکانی گەنمی قەندەهاری.

**سابروون** (دەر.): نێری، کوور.

**سابرێن** (هەورا.): نێری.

**سابرین** (هەورا.، بابا.): نێری.

**سابری** (هەورا.): نێری، تگە، ئەڕە، خرت، بزنە نێرێکە تەمەنی لە سێ ساڵی دابێ یا پتر هێڵرابێتەوە بۆ توو (تۆو).

**سابلاخ:** شارێکە لە کوردستانی کوێستانێدا و پایتەختی هەرێمی موکریانی لە ساڵی (١٩٤٦) دا بە سەرۆکایەتی قازی محەممەدی بوو بە پایتەخت و کۆمارێکی ناوداری لێ دامەزرا، لە ١٩٤٧دا قازی محەممەد شەهید کرا.

**سابلاخی:** کەسێکە لە سابلاخێ لە دایک بووبێ و لە وێ پەروەردە بووبێ.

**سابوون:** خاوێنەر، پێشۆر، سابین، ساوون، چتێکە لە چەوری و قەلیە دروستدەکرێ، کەجلک و کەل وپەلی چڵکنی پێدەشۆرێ و خاوێندەکرێتەوە.

**سابوونئاو:** ساوونئاو، کە ئاوێکە لە وورده سابوون و ئاوی گەرم ڕێکدەخرێ بۆ کەل وپەل پێشووشتنی.

**سابوونچی:** ساوونچی.

**سابوونساز:** ساوونساز. ـ ی: ساوونسازی.

**سابوونی:** جووره کۆترێکە.

**سابوونی ڕەقی:** جووره سابوونێکە.

**سابوونی زرانی** (فە.): کەشکەژنۆ.

**سابوونی لەگەڵەگ** (باد.): گوڵێکی سوورو ووردە لە نێو دەخڵاندا سەوز دەبێ.

**سابین:** سابوون.

**ساپ** (موک.): (هەورا.) ساف، بەردێکی پان و خشتە لە ساپێنیدا بە ڕێزەگوێزەو مەرمەڕو چتیتری دادەدەن چەند دانەیێکی لە گەڵ خۆ ڕادەفڕێنی. (باک.) گیای برنجی، چەڵتووک، تا، گیشەی گەنم و دانەوێڵە. (باک.) دەسک. (باک.) قەسەڵی دەغلی، دەغلی دروا وەیە، دبێژن م ساپی خوەو پەڵخاندییە، واتە گێرەم کردووە.

**ساپاچ** (کە.): مەری تەواو براوەوە.

**ساپان** (باک.): سەپان، ئەوکەسەیە دەغڵی دەدرووێتەوە. داسێکی گەورەیە.

**ساپساپانێ:** بڕوانە: ساپێن.

**ساپیتە** (دزە.): جێگایەکی کەمێک بڵندە لە سەردارانی دارەڕایە بۆ کاریتان دروستدەکرێ. (کۆ.) میچ.

**ساپیتک** (باک.): میچ، چڵەی پۆپەی بن میچ.

**ساپێن:** ساپساپێن، ساپساپانێ، سافسافێن، گەمەیەکی منداڵانەیە بە بەردی پان و تەنک و خشت و لووس لە ڕێزە گوێزیا جگ و ئیتری دەگرن.

**سات** (خۆ.): زۆر، گەلێک، فرە، تەنها لەو جوورە جێگایانەدا بەکار دەبرێ، ـــ برسیمە، ـــ تینوومە، ـــ ماندیمە. دەمێکی کەم، کات، گاڤ. کەرمێر، کاتژمێر، کە بریتییە لە شێست خولەک (دەقیقە). مەرازی کات ئەژماردنێ.

**ساتار** (باک.): پارچە جێگایەکی بێ دارە لە ناو جەنگەڵ و لێڕەوارانەدا.

**ساتان** (ڕەوا.): دەرپێ. (باک.) پارچە قوماشێکە.

**ساتاندن:** (باک.) تێکوڵ لە برنجکردنەوە، برنج کوتان، بساتینە.

**ساتای** (هەورا.): لەسایەی، لە ژێرسایەی.

**ساتل** (باک.): سەتڵ.

**ساتمە:** سەرەنگرێ، تووەخ، ـــ بردن: سەرەنگرێ بوون، هەڵەنگووتن لە ڕۆیشتنیدا، هەڵە لە گوفتوگۆدا.

**ساتمەکردن** (هەو.): هەڵەنگووتن، پێ هەڵکەوتن، نووچبردنی گیانداره لە ڕۆیشتنیدا.

**ساتن** (باک.): لێدان، شکاندن، کوتان.

**ساتۆ:** قەسە تۆرە، کێردێکی گەورەیە.

**ساتۆر** (کە.): قەسەتۆرە، دەمەچەقۆی بێ مشتۆی بێکارە، چەپەچاخ. (کە.) قەمەی چکۆڵەیە بە سەر تفەنگانەوە، کێردی گەورە.

**ساتۆرە:** ساتۆر.

**ساتۆرە** (باد.): خوورێری، تۆری. (باک.) چەقۆیەکی دەم پانی وەکوو داس وایە گۆشتی پێ وورد دەکرێ و ئێسکی پێ دەشکێنرێ.

**ساتوور:** تەوەرداس.

**ساتوولی** (باک.): هەرزەیی، پەستی، ڕژدی.

**ساتێ:** تاوێکی، دەمێکی.

**ساتی:** تاڵووکە، بە ـــ: بەتاڵووکە. تیرەییێکی کوردە.

**ساج:** سێڵ، ئاسنێکی تەنکی گەورەو خڕی ناوەند قۆقزە، کە لەسەر ئاگردان یا تەندوورونیتر دانرێ نانی لە سەر

ساتوور

دەبرژێ. دارێکی پتەوی جووان و سوورکارە لە دارتاشیدا بەکاردەبرێت.

**ساجاخ:** ساچاخ.

**ساجلەخ:** چەند جوورە پلپلەیێکی زێڕین یا زیوینە بە سەر پرچی دادەکرێ بۆ جووانی (لام وایە ترکیبیە).

**ساچاخ:** جوورە ڕیشوویێکی بادراوی جووانە دەهێڵرێتەوە لە چووار کەناری سووزە پێ و گۆشەی تاق وزین و نەرمەزین دەدرووێت. بافتەی کەناری سەڵتەو کەوایە. مووچاخ، بارۆکە.

**ساچان** (هەورا.): ووچاندان، هەسانەوە.

**ساچمە** (کەل.): فیشەک، لیپ، تەفرە. ووردە ئاسنە خڕەکانی تفەنگی ڕاوییە، کەلەە قورقوشم (مز) دروستدەکرێن. ووردە بەرد بە تایبەتی ئەوانەی، کە لە حەوش و داڵان و پێشدەرگایان دەگیرێ.

**ساچمەڕێژ:** بەردچن، بەردڕێژ، ڕەقف، ـــ کردن: ڕەقفکردن.

**ساچمەڕێژی:** بەردچنی، بەردڕێژی.

**ساچ و پەرچەم:** زاج و پەرچەم.

**ساحێبی** (موک.، خۆ.): جوورە ترێیەکە.

**ساحێوی:** بڕوانە: ساحێبی.

**ساخ:** خۆش، تەندروست، لەش بێ نەخۆشی، ساغ، لەشساغ، باخۆش. بەکەڵک، فەلاتکار. ڕاست، پیاوی ـــ: مرۆی ڕاست، ووتەی ـــ: ووتەی پاک و ڕاست و بێ ئەملاولا. دەق نەشکاو، دەست لێنەدراو. نەشکاو، بێکەم و کووری، قابی ـــ: قابی نەشکاو.

**ساخبێر** (باد.): (فە.) ڕێبەر، بەڕێوەبەر، هەڵسووڕێن.

**ساخبوون:** بژین.

**ساخت:** دەستکار، کاری دەست، دروستکراو، ئەم دیوارە ساختی وەستا نەرمانە. سازان، سازیان.

**ساختە:** هەڵبەست، بە درۆ پێکەوەنراو، ناڕاستی، فیچەڵفاچ، داتاشراو، گزە، درۆ، دەلەسە، داڕژتوو، داڕێژراو، کەڵەک، بنجامەتی، کوول، فەڕو فێڵ، ڕێکخراو، فڕوفێڵ و تەڵەکە.

**ساختەچێتی:** قۆڵبڕی، ساختەکاری، کردنی کردەوەی پڕ فڕوفێڵ، ساختەچیەتی، قۆڵبڕی، فێڵبازی.

**ساختەچی:** ساختەکار، کەرسەک، گزەوون، (باک.) بنجامە، فێڵباز، فەڕو فێڵکار، دروزن، (کە.) بەزاج، (دزە.) چارقاپ، قۆڵبڕ.

**ساختەچیەتی:** قۆڵبڕی، فێڵبازی، ساختەکاری.

**ساختەکار:** ساختەچی، (کە.) بەزاج، هەڵبەستەر. ـــی (باک.): بنجامە، هەڵبەستن، داڕژتن، بنجامەتی، ساختەچێتی، فیچەڵفاچ.

**ساختەکردن:** داتاشین.

**ساختەگی:** دەستپەڵبەست، دەسپەڵبەس، دەسڕەن.

**ساختەیی:** بڕوانە: ساختەچیەتی.

**ساختمان:** خانووبەرە، سەراپەردە، کۆشک، ماڵ.

**ساختووباخت:** سازوباز، ڕێککەوتن، ئاشتبوونەوە. (ئەردە.) خلێنەو بلێنە.

**ساخکردنەوە:** (هەورا.) ساقکردنەوە، ساخکردنەوەو چووانندنی پارەیەکی یا فرۆشتنی چتێک. لێکۆڵینەوەی کار، زیندوو کردنەوەی چتی لە دەستچوو، حساب پاککردنەوە، پاککردنەوەی ئەژمێریاری (حساب).

**ساخ کردنەوە**: دەرخستن، خۆشکردن.

**ساخوول هۆر**: کادان، کادێن.

**ساخولەت** (باد.): ڕانە، هەڵگۆ.

**ساخی**: خۆشی، تەندروستی، خووەشی، (هەورا.) ساقی.

**ساخی پارازتن**: (هەورا.) ساخی پارێزنای.

**ساخی پارێزنای** (هەورا.): ساخی پارازتن.

**ساد** (باک.): تیکە، پارچە.

**سادا** (باک.): ناوی گوندێکی کوردانە لە ڕۆژهەڵاتی شاری عاموودێ و هەم ڕەنگە دێیەک بێ لە ناو ئۆمەرییاندا، کە شەڕێکی گەورە لەوێدا ڕووی داوە.

**سادار** (هەورا.): وێڵ، دەربەدەر، دێوانە. هۆ، بۆتە، سایە.

**ساداریی**: وێڵی، دەربەدەری.

**سادانی**: جوورە ترێیەکی سپی دەنک شاش و ناسکە.

**سادە**: ساکار، یەکڕەنگ، خۆڕوو، (باک.) سایە. کەمهۆش، سادەکار، سادەلەوح، چاوگرتی، ساویلکە. کوڕێکە هێشتا تووکی لێنەهاتبێ.

**سادەکار**: سادەلەوح. ـــ ی: سادەیی، سادەلەوحی.

**سادەلەوح**: سادە، کەمهۆش، بێهۆش، گێل. ـــ ی: سادەیی، کەمهۆشی.

**سادەیی**: ساکاری.

**سادر** (باک.): تەوەرداسی چکۆڵە.

**سادۆ** (باک.): ناوی مرۆڤێکییە، سادی حەمێ، گاسۆ لە چیای ڕۆژهەڵاتی دێرکان لە چیای مازوویە بە مێرانی دەنگی دابۆوە.

**سادۆڵ** (کە.): جۆگەییێکە لە جێگاو لە جیاتی دۆڵاشی ئاش لە قسڵ و بەرد و گێچ دروستدەکرێ بەڵاں ڕووکاری لای دەرەوەی ناگیرێ.

**سادیل** (باک.): جووزە، لکە گچکەکانی دارو گیا، یانە، خەڵف.

**سار**: وەک، وەکوو، خاکسار: وەکوو خاک. (دەو.، باک.) سارد، (هەورا.) سەرد. باران، سەنگسار: بەردەباران. ستان، سان، جێگا، شوێن، زۆر، گەلێک، فرە، بە تەنهایی بەکار نابرێ بەڵکوو بە دووای هەندێک ناوانەوە دەنووسێ، کۆسار، کێفسار.

**سارا** (باک.): ناوی ژنانە، ناوی گۆرانییەکی کوردیشە. (گڕ.) سبەینێ. دەشت، بیاران، بیابان. پاک، خاوێن، وێژە، خۆڕوو.

**ساراکردنەوە**: تەختکردنی شووێنێکی ناڕێک و کردنە دەشت.

**سارا نشین**: دەشت نشین.

**سارە** (گڕ.، باجە.): سبەینێ.

**سارەما**: تێبەردانی کارو بەرخانە لە بەیانیاندا لە پێش دۆشینی دایکیاندا.

**سارەوان**: ووشترەوان. ـــ ی: ووشترەوانی.

**سارد**: (باد.) سار، سەرد، چەییک، چەییگ، چیاو، سەهۆڵ و بەفر ساردن، زستانان هەوا ساردە، دژی گەرمییە، هەوای سارد: سەرما.

**ساردئاو**: مەسنا، ناویس، ئاڤسارک، مێچ، سەرداو، سارنج، زێرزەمین، حەوزێکی سەرداپۆشراوی پڕئاوە و هەتاوی وێناکەوێ و ئاوەکەی سارد دەبێ، سا لەچۆڵی یا لە ناو ماڵانبێ.

**ساردئاوە** (لو.): حەوز.

**ساردایی**: ساردی، سڕی.

**سارده** (شا.): سندان (بۆ جنێو). برنجێکە ناوی پاییزی خوواردبێتەوە و دەرەنگ پێبگات وەکوو گەرمە نەبێت، کەنەم دەرەنگ پێ دەگات.

**ساردەدەرد**: سندان، دەردێکە هەناوی مرۆو هەموو گیان لەبەرێکی دادەگرێ. بۆ جنێویش بەکاردەبرێ.

**ساردەسێر**: کوێستان. ـــ ی: کوێستانی.

**ساردەستدان**: ئازارێکە لە سەرماوە ناوزگ کرژ دەکات. بۆ جنێو بۆ کەسێک بە کار دەبرێ، کە بانگت کات.

**ساردەگیا**: گیایەکە وەکوو گەنمی وایە، بەڵاں گوڵەکەی وەهی جۆی دەچێ و بێ دانە لە نێو دەغڵاندا شین دەبێ.

**ساردەمەنی**: بۆ هەموو چتێکی سارد بەکاردەبرێ، کە بۆ خوواردن و خوواردنەوە دەست بدات.

**ساردبوون**: واتە گەرمایی نەمان، کەبەفر یا سەهۆڵ لە نێو ناوی بخرێ سارد دەبێ.

**ساردبوونەوە**: گەرمایی نەمان. پەشیمان بوونەوە، خاوبوونەوە لە کردنی کارێکی. ناهومێدبوون. مردن.

**ساردکردن**: سەردکردن، دووایی پاییزە سووی سارد کردووە.

**ساردکردنەوە**: گەرمایی چت لابردن. کوژتنی گیان لەبەرێک. پەشیمان کردنەوەی یەکێک لە کارێک یا لە بڕیار و دووانێک.

**ساردنەوێ** (خۆ.): شیناوەردی ناودان، لەبنەڕەتدا مەبەس لە ساردکردنەوەیە، تووتنی دەسێرمەوە: تووتنم ساردەوە.

**ساردوسەرما**: کاتی سەرماوسۆڵە.

**ساردۆنیا**: گوڵێکی سووری جووانی گەڵاپانە.

**ساردوسڕ**: زۆرسارد. مەبەس لە کەسێکییە، کە ڕووی خۆش نەبێ لەگەڵ ئەم و ئەو.

**ساردوسڕی**: سەرماوسۆڵە. ڕوونەدان، ڕووی خۆش نیشان نەدان بە کەسێکی، نامیهرەبانی.

**ساردوگەرم**: چتی شیرتێن.

**ساردوگەرم کەوتن**: مەبەس لە باڵ و پەڕکردنێیە.

**ساردی**: سەردی، ساری، سەرماوسۆڵە. ساردەمەنی.

**ساردی و سڕی**: سەرماو سڕی.

**سارمە**: سالمە، گیایەکی پاییزییە گەڵای وەکوو نەسپنگ وایە گوڵێکی گچکەی زەرد دەگرێ. قۆزاخەی ئاوریشمی هەڵکراوە.

**سارنج** (باک.) سارینج، سێرنج، سارداو، ئانباری ئاو، کۆگەی ناوی بارانە و ئیتر، سەرداو.

**سارۆ**: ناوی ئافرەتێکییە بەستەیەکی لەسەر هەڵبەستراوە.

**سارۆخ** (ئەردە.): سەرپۆش.

**سارومار**: ووشەیێکە وەچتی زۆر بۆگەنی دەچووێنن، دەڵێن ئەو چتەبۆنی ـــ ی لێدێ: زۆر بۆگەنە.

**ساڕێژ**: هێدی، ئارام، هێمن. گۆشتە زوونە.

**ساڕێژبوون**: دامرکان و ئارام بوونی ژانی برین و لەش و بە جارێکی چابوونەوە و گۆشتە زوونە هێنانەوەی.

**سارێژبوونەوە:** گۆشتە زوونە هێنانەوە.

**سارێژبوونی برین:** سارێژ بیەو زەخمی.

**سارێژبیەی** (هەورا.): سارێژبوونی برین.

**سارێژەکردن:** ئاشتکردنەوەو دڵهێنانەوە جێی یەکێکی دڵشکاو.

**سارێژکردنەوە:** خۆش چاک کردنەوەی برین و دەردو ئازاران، دامرکاندن، دەرمانەکە برینەکەی سارێژکردەوە: ئێش و ئۆفی دامرکاندو گۆشتە زوونەی پێهێناوە.

**سارێژی:** سارێژبوون.

**سارێش:** سارێژ.

**ساری** (باک.): ساردی. نامیهرەبانی.

**ساز:** ڕێکخەر، دروستکار، بەڵان بە تەنهایی بە کار نابرێ بە دووای ووشانەوە دەنووسێ، کارساز، چارەساز. یەکێکە لە مرازانی بەزم و ئاهەنگ و شایلۆغان، بە هەموو پارچەکانی مرازی شایلۆغانیش دەڵێن. ئامادە، دروست، ڕێک و جووان، ڕێک و پێک، ـــ بوون: ڕێککەوتن، ئامادەبوون، نا ـــ: ناڕێک، بێکێس. ڕێکخراو، ئامادەکراو. ساخ، ساق، دروست.

**سازاخ** (باک.): بای تەڕ، بۆران.

**سازان:** ڕێککەوتن، سازیان، بڕیارلەسەردان، پێکهاتن.

**سازاندن:** ڕێکخستنی یەکێک یا چتێک.

**سازاو:** ڕێک کەوتوو.

**سازبەند** (باک.): سازندە، مۆزیقەچی، کەسێکە شارەزای سازلێدانێ بێ. ـــ ی: سازندەیی، مۆزیقەوانی.

**سازبوون:** ئامادەبوون، گونجان، هەڵسووڕان، پێکهاتن، دروستبوون، ڕێککەوتن.

**سازدان:** ڕێکخستن، سازکردن.

**سازکەردەی:** سازکردن.

**سازکردن:** ئامادەکردن، تەربیت کردن.

**سازگ** (کۆ.): ترشیاتێکە بە شێلم دروست دەکرێ، تەڕەساز.

**سازگار:** لەبار، کیس، ڕەوا، بژوون، نەرمەنیشک، هێژا، ئاووهەواییێکە سووک بێ و لە تەندام بکەوێ. ـــ ی: بژوونی، کێسی، سووکی و خۆشی ئاوو هەوای شوورێنێکییە وەکوو کوردستان وابێ.

**سازگەر:** سازگار. ـــ ی: سازگاری.

**سازنە:** سازندە.

**سازندە:** سازلێدەر، سازبەند. کارو فەرمان ڕێکخەر. زۆربلێ، چەنەباز. جندە، حیز، سووزمانی. ـــ یی: سازلێدان، ڕێکخستن، زۆربلێیی، حیزی.

**سازوان** (هەورا.): شایلۆغانەوان.

**سازوپاز** (ئەردە.): بەننویەس، ساخت و پاخت، خلینە و بلێنە، سازیان.

**ساز و سەودا:** کەڵکەڵەی چتێک، ئازاد تۆی خستەسەر ئەم ـــ یە.

**سازی:** باری ڕێک کەوتن و یەکێتی ڕێکی، ئامادەیی.

**سازیان** (ئەردە.): سازان، ڕێککەوتن.

**سازی چلچەنگ** (هەورا.): جوورە سازێکە.

**سازین:** سازان.

**ساس:** جوورە فرنوویەکی سوورکارە لە ناو ماڵان و کەرەستەی دارینەدا پێدەگات. مۆرانەییێکە کەل و پەلێکی دەخوا، کەلە خوری دروستکرابێ.

**ساسان:** باپیرە گەورەی بنەماڵەی دەوڵەتی ساسانیان بووە، فەرمانڕەوایی ساسۆنی ناودارە خەلک، شەرەفخانی بتلیسی دەفەرمووێ: ساسۆنی لە ساسانیەوە پاشەکەوت بوون و دەچنە وەسەر نەوشیرەوان.

**ساسوون:** خەڵکی چیای ساسۆنێ بە ئازایی و مرۆڤایەتی دەنگیان داوەتەوە لە پاش شۆڕشی شێخ سەعیدە لە ساڵی ۱۹۲۵ دا خەڵکی ساسۆنێ چەند ساڵێکی دوورو درێژ خۆیان نەداوەتە دەست دوژمنی خۆیان ماڵی عەلی یونس لەو بەسەرهاتەدا خاوەند ناوو ناوبانگ و بەرێزبوون، ئەمیر شەرەفخانی بتلیسی دەفەرمووێ ساسۆنی لە ساسانیانەوەیە و لە بنەماڵەی نەوشیرەوانیەوە پاشکەوتوون.

**ساغ:** مرۆی ڕاست و بێ فروفێڵ. چتی بێکەم و کووڕی و شکستی. گیاندارێکە نەخۆش، ساق، ساخ، تەندروست، لەشساغ.

**ساغبوون:** ڕاست و بێ فرو فێڵ بوون. بێ کەم و کووڕی بوون.

**ساغ بوونەوە:** چابوونەوەی نەخۆشی. فرۆشرانی چت و نەمانەوەی. دەرچوونی هاویەش ولە کارێکیدا مانەوەی چتەکە بۆتۆ.

**ساغکردنەوە:** چاککردنەوە. فرۆشتنی چتێک و نەهێشتنەوەی. دەرکردنی هاویەش لە کاروبارێکیدا و هێشتنەوەی بۆ خۆت.

**ساغی:** ڕاستی، بێ فروفێڵی. ساخی، بێ کەلێ و کۆمی چت. نەخۆش نەبوونی گیاندار.

**ساف:** ساپ، (ڕەوا.، کە.، دزە.) سام، هەراس، ترس. دەزوو، تیرە. قەوانە. لووس، خز، هامار، خشت.

**سافسافێن:** گەمەیەکی مندالانە بەردێکی یا جگ یان چەند گوێزێکی دادەکەن و لە دوورەوە بەردێکی پانی تەنکی ڕێکی بەخشکەیی تێدەگرن.

**سافۆ** (باک.): ڕنوو، ڕنی، کۆمای بەفری. (باک.) قاپی مس.

**سافێن:** ساپێن، ساپساپانێ.

**سافیا** (باک.): گوندێکە لە ناو سلیڤاندایە کەوتۆتە ناو دەشتی ئامەد (دیاربەکر) ی گۆرانیەکانی (باقی بەهجەت) و (خێریا حەجێ) لەو گوندەدا پەیدابووە.

**سافیلکە:** ساویلکە.

**ساف** (باک.): هەلامەت، پەسیو.

**سافا** (باک.): ساوا، بەبە، کە باران نەباری بووکێکی چادەکەن و بە ماڵانەوە دەگەڕێن و دەڵێن: گۆلکامە گەیا دڤێ، بووکا مە ساکار دڤێ، مەژ خوەدێ باران دڤێ.

**سافار** (باک.): ساوار.

**ساق:** لوولاک، لوولاق. (باک.) پووزەوانەی خوری و موویە. لاسکی گیا و گوڵان و قەدی دارانە. ـــ ێ جزمێ: لاسکی جزمەی، بۆ لاسکی گۆرەویش بەکاردەبرێ. (هەورا.) ساخ، ساغ، دژی نەخۆش. ڕیقنەی شلی پەلەوورانە. تەپ، سل، ساقەگوو.

**ساقەت:** ـــ ەتری: لاسک و قونچکەکانی ترێ، (هەو.) بستە، (باک.) بستی.

**سقەتە** (ئەردە.): قەدی درەخت و سەوزاییە.

**سقەتە سۆرە** (هەو.): (موک.) زەڕنەقووتەڵە، بێچووە باڵندەی بێ تووکە، کە تازە لە هێلکەی هاتبێتە دەرەوە.

**سقدرەخت**: تەنەی داران.

**سقگەنم**: لاسکی گەنم.

**سقۆ**: پاڵتۆ، قاپووت، (کە.) پاڵتاو، (باک.) ساکۆ.

**سقۆڵ** (ئەردە.): لوولاک. باسک. سەوەتەی ترێیە.

**سقعەول** (باک.): تۆپی گەمەیە.

**سقی**: ساغی.

**سقی پەڕ**: پەڕی باڵندان.

**سقی و بقی**: گۆڕینەوەی چتێک بە چتێک لە گەڵ ماوەوە دانەوەدا، تاڵ و گۆڕ، ئاڵشت.

**ساک** (باک.): جەواڵ، خورج. (زا.) پالاّغ، بێچووی گامێش.

**ساکات**: سێبەر، نیسێ.

**ساکار**: یەکڕەنگ، سادە، بێ گوڵ.

**ساکەبەیار**: بەیارێکە سادەو ساکاربێ.

**ساکۆ** (باک.): ساقۆ. (ئەردە.) سەکۆ. کێوی سادەو ڕووت، کە بەردوداری پێوەنەبێ.

**ساکۆڵ** (باک.): گیانداری گەمژە.

**ساکوول** (باک.): بەخت وەرگەڕاو، هەرزە، سووک، هیچ و پووچ.

**ساگات**: سێبەر.

**ساگەوان** (فە.): ماڵۆسی، بەرازی مێیە.

**سال**: ساڵ.

**ساڵ**: ناوە بۆ هەر دووازدە مانگەکانی وەرز، کە ڕۆژ چەرخەیەکی تێدا دەکا لەکەلووی بەرخ (حمل) ەوە تا دووایی کە لووی ماسی (حوت)، وەرز، وەند، خرت، ــ بردنەسەر: ساڵ تەواوکردن، ــ سووڕانەوە: ساڵ وەرگەڕانەوە، ــ گەڕانەوە: ساڵ وەرگەڕانەوە، ساڵ سووڕانەوە، لە حەوت ساڵان گەڕانەوە: مەبەس لە مردنە، ساڵ ٤ بەشە: ٣مانگ بەهار، ٣مانگ هاوین، ٣مانگ پاییزو ٣مانگ زستان.

**سالار**: سەردار، سەروەر، سەرۆک، سەرکردە. نێوی نێرینانە. ــ ی: سەرداری.

**سالاکۆنی** (باک.): ساڵی ڕابردوو.

**ساڵان**: (ئەردە.) ساڵگەل، وەرزگەل، ساڵیان.

**ساڵانە**: زێو، مزوکرێی ساڵانە، مووچەیێکە، کە ساڵ بە ساڵ بدرێ بە یەکێک، مووچەی ساڵێ. خێرێکە بە ئاتاجان بدرێ لە پاش تێپەڕینی ساڵێک بە سەر مردنی کەسێکیدا.

**ساڵ نەوەر**: ساڵی هات.

**ساڵی نەیند**: ساڵی دادێ، ساڵێکی تر.

**ساڵەک زێڕە** (باک.): لەیەکساڵدا.

**ساڵەیی**: هۆزێکی کوردە لە کەناری شاری کەرکووکێیە.

**ساڵەوساڵ**: ساڵ بەساڵ.

**ساڵبەر**: ساڵ ئاوەر، ساڵ نەساڵ، بۆ باغ و گیان لەبەرێکی بەکاردەبرێ، کە ساڵێکی بەری بگرێ و ساڵێکی نەگرێ.

**ساڵبووێر**: (باد.) ساڵبێر، ئاژاڵ و ڕەشە وولاّخی مێیە، کە ساڵە نا ساڵێکی بزێ.

**ساڵحی** (بابا.): جوورە ترێیەکە.

**ساڵخوردە**: پیری کۆنەساڵ، ساڵدار.

**ساڵی سێزدە مانگ**: ساڵێکە سێزدە مانگ بێ بە ئارەوی پێی دەڵێن: (کبیسةالکبانس).

**سالم**(ئەردە.): ساڵمە، ڕەگی گیایەکیە گوڵەکەی سوورە. (ئەردە.) ساڵمە، کە سەعلەبی پێدەڵێن.

**ساڵمە**: سارمە، گیایەکی سەلک داری بەهارییە سەلکەکەی بە نرخە و بە کاری گەلێ چتان دێت، هێندێکیش دەڵێن پاییزییە گەلاّی وەکوو ئەسپەنگییە گوڵیشی زەردو گچکەیە.

**ساڵنامە**: نووسراوێکە بە دەستنووس یا بە چاپکراوی، کە ژمارەگەری هەموو ڕۆژەکانی ساڵێ دەکات.

**ساڵنەساڵ**: ساڵە نا ساڵێکی دی.

**ساڵنما** (ئەردە.): ساڵنامە.

**سالۆخ**: سالۆغ، دەنگ و باس.

**سالۆخی** (باک.): سۆراخ.

**سالۆز** (هەو.، شن.): سالۆس، زمان تێکەلاّو، خۆناشیکار، کەسێکە لە کاروباراندا خۆی تەنبەڵ و بە ساختە خۆی تەوەزەل بکات، ساختەچی. ڕیاباز. ــ ی: ساختە لە کاروباراندا کردن، خۆناشیکردن.

**سالۆزی کردن**: بەساختە لە کاروباراندا خۆناشی وتەنبەڵ کردن، فرت و فێڵکردن.

**سالۆس** (خۆ.): سالۆز. ــ ی: سالۆزی.

**سالۆغ**: سۆراغکردن.

**سالووس**: چتی سادەی خاوێن و لووس، تێلاّی لووسی بێ گرێ.

**سالووق**: تووکی نەرمی گیاندار.

**سالووک**: لات، بێ پووڵ و پارە، نابووت.

**سالوول** (باک.): ژووری تایبەتییە لە زینداناندا، کە مرۆی زۆر تاوانباری بەتەنێ تێدەکەن.

**ساڵها** (باک.): ئێلێکی کوردانە لە ناو هەڤێرکاندایە لە باکووری ڕۆژەلاّتی شاری نصیبینی دایە، (ساڵها و دومان) دوو بەرەبابن لە هەڤێرکاندا.

**ساڵی ئامێ** (هەورا.): ساڵی دادێ.

**ساڵیان** (ڕۆژ.): خەراجی ساڵانەیە، پیتاک کۆکردنەوە. (ئەردە.) ساڵیانە، ساڵان.

**ساڵیانە**: ساڵبڕ، مووچەی ساڵانە. ساڵانەی مردوو.

**ساڵی چەک** (فە.): ساڵی ڕابردوو.

**ساڵی دادێ**: ساڵی دوای ئەم ساڵ، کە هێشتا نەهاتووە. *

**ساڵی ڕابردوو**: پار، پارەکە.

**سالیس**: تێلاّی لووسی بێگرێ.

**سالّین:** سالیانەوە. *

**سام:** ساف، زەبروزەنگ، (باک.) سەهو، ترس و هەراسێکە، کە هەندێجار لە گیانداردەنیشێ، بە ـــ : بکەرب، سامدار، ترسێن.

**سامگرتن:** پێداهێنان، سام لێکردن: ترسان. (سام) دەڵێن سام یەکێکە لە چوار کورەکانی (نووح) ی، کە بریتین لە (سام، حام، ئیرەج، توورەج). ناوی گەرناسێکی کوردە، کە باب و باپیری ڕۆستەمی ناودارە، ڕۆستەم کوڕی زاڵ کوڕی سام کوڕی نەریمان، شەرەفخان دەڵێ ئەو ڕۆستەمە کوردە لەشانامەدا دەڵێ:

یەکێ جام و بادە بەڕۆستەم سپەورد
بەوەی گوفت کەی نامبەرداری گورد
بگوید کە کوردان توراخاستەند
سەری تەختی ئێران بیاراستەند

داماو (حسین حوزنی موکریانی) خۆشی نەدیتووی بەرام دەڵێ: کُورد کوردە، زۆر ترینی مێژوونووسانی فەرەنگیش هەر لەو بڕوایەدان.

**سامالّ:** سار، سایەقە، ئاسمانی بێ هەور.

**سامالّەکردن:** دووبارە ماڵەکردنەوەی زەوی.

**سامالّکردن:** نەمانی هەورو پەیدابوونی سایەقە.

**سامالّی:** ساوی، سایەقەیی.

**سامان:** (باک.) ماڵ، خوەدیتی، دەست و دوو، پەرویۆ، پەڵوپۆ، تەرو تفاق، (باک.) بۆچک، دەوڵەت، خوەماڵی، دەسترۆیشتن، بێ ـــ : هەژار، دەستکورت، لات نەبوو. (موک.) لا، ناو، ناوچە. ئامان، ئاوو ئاوور ـــ یان نیە، واتە ئاوو ئاوور ئامانیان نییە. (موک.) هات و چۆ. سەقام، یاسا. (ئەردە.) شێواو، بەرباد، بێ سەقام.

**سامانادار:** دەوڵەمەند. ـــ ی: دەوڵەمەندی.

**سامانادان:** سەقامدان، دروستکردن، ڕێک خستن.

**سامانایین** (ئەردە.): ڕێکخستنی چت.

**سامانکردن:** بەربادکردن، بێسەقامکردن.

**سامانگە:** شوێنێکە پووڵ و ماڵی تێدا دابنرێ.

**سامتە:** سامۆتە.

**سامتین:** سانتین.

**سامدار:** بکەرب، بەسام، پڕسام، ترسێن، ترسێنەر، بەرچاو، پێشچاو. ـــ ی: ترسان، سافکردن، سامناک.

**سامکردن:** ترسان، سافکردن، سامناکی.

**سامگا:** جێگای پڕترس و سام.

**سام لێ کردن:** لێترسان.

**سام لێ نیشتن:** ترسان.

**سامناک:** سامدار، بەسام، بەترس. ـــ ی: سامداری.

**سامۆتە:** سامۆتک، چوار بەنی ئەستوورن بە پاشکۆی زینییەوە شۆڕدەبنەوە بۆ بەستنی، دابەستنی کەل و پەل و یا خورجێن بە پاشکۆی سوواردا.

**سامۆتک:** تارمایی. سامۆتە.

**سامیتیل** (باک.): بەنێکە هەردووک سەری نیری پێ دەبەستری.

**سامیر** (باک.): جوورە چێشتێکە. (زا.) جوورە هەرزنێکە.

**سان:** ستان، سار، شوێن، جێگا، زێد، نیشتمان، بە تەنهایی بەکارنابرێ بەڵکوو بە دووای ناوانەوە دەنووسێ و زۆری واتای ناوەکان نیشاندەدات وەکوو کوردسان، دارسان، گوڵسان، واتە جێگای کوردان، داران و گوڵان، کێڤسان. ڕێز، تیپ، قەتارە، پێشمەرگەو قوتابیان بە ـــ ڕاوەستاوون: پێشمەرگەو قوتابیان ڕێزبوون و سانیانگرتوە، لە ـــ دان: ڕێزکردن، بەقەتار ڕاگرتن. (کە.، هەورا.) گەورە، خان، ئاغا، سەرۆک، سەری سەرداران، پادشا، شاهەنشا. (ڕەوا.) هەسان. (فە.، مەلیش.) بەرد، بەر، کوچک.

**سانا:** ئاسان، بێ ئەرک، دژی قورس و گرانە.

**سانابد:** هەوارگە. نێوی کورانە.

**سانالّە** (هەورا.): سەکۆ یا شوێنێکە سوواغدرابێ و هێڵە سارکرابێ بۆ میوە لەسەر هەڵخستن و دانەوێڵە.

**سانالّێ** (هەورا.): ئەو سوواخەیە، کەبە سیرەکۆڵێ سووابێتەوە، بەسوواخی تر هەر دەڵێن سوواخ.

**سانهی** (باد.): ئاسانی، سانایی.

**سانای:** ئاسانی.

**سانیی:** ساناهی، ئاسانی، سانەهی.

**سانەوە:** حەسانەوە، پشوودان، ئاسوودەبوون.

**سان بەستن:** ڕێزبوونی قوتابی و پێشمەرگان، چینی قوتابیان سانیان بەستووە، لەشکری پێشمەرگان بەسان ڕاوەستان.

**سانتیم:** سانتیمەتر. سانتین.

**سانتین:** سانتیم، سامتین، جوورە دەزوویەکی پوختی بریقەداری قایمە.

**سانتیمەتر:** سەد یەکی مەترێکی، سانتیم، (لە ڕۆژاواییان وەرگیراوە).

**سانجۆر** (زا.): ژانەزگ، زگئێشە.

**سانجۆل** (زا.): قەلادەی ملی سەگان.

**سانده:** سوواندەی بانی، گووێ سووانە.

**سانگۆ** (باک.): جووانەگای دووساڵانە.

**سانی** (باک.): گڕی ئاووری.

**سانیلکە:** ئاسان، سانا.

**سانیلکۆکە** (خۆ.): ئاسانی، سانایی، زۆرئاسان، سادە.

**ساو:** سامالّ، (هەورا.) سای، ساهی، سایەقە، ئاسمانی بێ هەوور. مەودای دمی تیغ، گوویزانەکە لە چووە واتە کول بووە، تیژایی نەماوە. (هەورا.) سێو. (ئەردە.) ساوین، ماڵشت. (باک.) ساف، سام، ترس.

**ساوا:** بەچکەی هەموو گیان لەبەرێکییە، منداڵی ساوا، کۆرپە، کۆرپەڵە، زراسک، ساڤا، شلک، قنۆرک، کۆرپەی تازە بووی گیاندار. بۆ ڕووەک و هەموو جوورە شیناوەردێکی بەکار دێت، کە تازە سەری لە خاک دەرهێنابێ. شلک. گووێلکی ساوا: گوێلکێکە تازە لە دایک بوویێ.

**ساوا:** بەرخساوا، کەمێ بێ، لەساڵی یەکەمیدا: بەرخەمێیە، لەساڵی دووەمیدا: بەردیلە، لەساڵی سێیەمیدا: بەردیلە، لەساڵی چووارەمیدا: مەڕە.

**ساواخی** (کە.): ساوایی، ئاییلّی منداڵ، کۆرپەیی.

**ساوار:** (باک.) ساڤار، (هەورا.) پەتڵە، ساوەر، (ئەردە.) ساوور.

**ساواز:** ڕووداماڵراو، ڕووداماڵیاگ.

**ساوان:** سوونەوە، سووین، ساوین.

**ساوانی** (ئەردە.): هەستی دەست لێدان، هەستی لێکەوتن.

**ساوای** (هەورا.): سیو.

**ساوایی:** (کە.) ساواخی، ئاییلی منداڵ، کۆرپەیی، کاتی منداڵی. هەستی وێکەوتن.

**ساوە:** سا، کات، دەم، لەوساوە.

**ساوەر**(ئەردە.): ساورین. ساوار، ساوور.

**ساوەرە:** داوەرە.

**ساوەرکوت:** کەسێکە ساواری بکوتێ.

**ساوەرین** (ئەردە.): سابرێن.

**ساوەساو:** خاوەخاو، سستی.

**ساوەساوی:** خاوەخاوی، سستی نواندن.*

**ساوەڵ:** دارێکی درێژو سەرخڕە وبنەوەی بەرداشی دەدرێ تا بەرداشەکەی پێ بێنن و ببەن، لوێل. چوارچێوەیەکی دارینە دەخرێتە سەرپشتی وولاخ بۆ دارپێکێشان و بەردکێشان.

**ساوەڵەوان** (هەورا.، دەلو.): بەرخەوان.

**ساوداان** (کە.): ئامادەکردن. سوونەوەی تیغ لە هەساندان.

**ساورێن** (جا.): نێری بزنانە، سابرێن.

**ساوور** (ئەردە.): ساوار، بڕوێش.

**ساوورمە:** داری سووتەمەنی ووشکی لووسی بێ قەڵبەوگرێ.

**ساوورین** (ئەردە.): چێشتی ساواری.

**ساووڵ** (شا.): دووداره نێوەکەی پردەکەمن لەدار تەنها تەنگەکێشانی پێدەوێ.

**ساو وو** (زا.): سووین، سووانەوە، چەقۆو هەموو جووره تیغێک تیژکردن، ساوین.

**ساووون** (ئەردە.): سابوون.

**ساوی:** خواردەمەنییەکە لە دێهاتان کۆ بکرێتەوە. (هەورا.) شێو. (باک.) ڕاست، چتێکە خوارنەبێ، جووره قابێکیشە.

**ساویاگ:** سواو، تیغی سووراو. چتێکە ووردکرابێ و سوورابێتەوە، سوواوەوە.

**ساویان** (هەورا.): سووانەوە، ساوین، هاڕیان، ماڵیان.

**ساویای:** سوواوەوە.

**ساویلکە** (کە.): دڵپاک، سادە، بەستەزمان.

**ساوین** (کە.): سووین، سوونەوەی چەقۆو نیشتر بۆ تیژبوونی. هاڕین و ووردکردنی چت.

**ساوینەوە:** سوونەوەی کەشکە لەناو سووێندا یا گلۆفتنی چتە.

**ساوین پیا** (ئەردە.): تێهەڵسوون، ناوین پیا، (ئەردە.) ساوین.

**ساهی** (زا.): ساو، سایەقە. (باک.) سەرما و ساوی شەوێ.

**ساهیک** (باک.): تەپاڵە، دەوە.

**سای** (هەورا.): ساو، ساماڵ. سێبەر، نیسێ، سەی.

**سایا** (باک.): جووره بووزوویەکە. (باک.) سادە، یەکرەنگ، ساکار. سایە، پیاوەتی، میهرەبانی، چاکە.

**سایە:** سایەقە، ساو. سێبەر، نیسێ، سێوەر. خووێندنەوەی چت بە حونجەیی. ڕەنگی ئاسن. بسایا سەرێ تە ئەم پارێک نان دخۆن، پیاوەتی، میهرەبانی، خێر، (کەل.، زەن.) جووڵانەوە، لەـــی تووە کارەکەم پێکهات. ژمارەیەکە لە قوماری ئەسکەمبلدا، پاپاژ چوارـــ ڕادەکێشێ. کەوای درێژی ژنانە، سایی، (هەو.) کەوێ. (موک.) جووره ووشترێکە.

**سایەبان:** سەیوان، چەتر. بە هەموو چتێکی وا دەڵێن، کە سێبەری هەبێ. سایە چەوور، مرۆی بەرچاوتێرکە.

**سایە چەوور:** مرۆی چاوتێرە، کەمەردوم لە ژێر سایەیدا بحەسێتەوە.

**سایەدار:** سێبەردار. کەسێکە مەردوم لە ژێرسێبەریدا بحەسێتەوە. ـــ ی: سێبەرداری.

**سایەقە:** ساو، ساماڵ، سایقە، ئاسمانی بێ هەورو تەم و مژ و پاک.

**سایەک** (لو.): سێبەر.

**سایەنشین:** لە ژێر سێبەردا دانیشتن.

**سایەنی:** سەحانی، ڕازقی، ڕاسقی.

**سایەوان** (ئەردە.): سایەبان، بە هەموو چتێکی وا دەڵێن، کە سێبەری بکات.

**سایە ووشک:** مەردومی ڕژد و بەرچاوتەنگ و چرووک.

**سایراو:** سوواوەوە.

**سایز:** (هەورا.، بابا.) مەیتەر

**سایس** (باک.): نێری دووساڵانە.

**سایقە:** سایەقە، ساماڵ.

**سایلە** (هەورا.): پەڵووڵەی ئارد، ئاردی بۆدراو لە ئاوی داغ دەکرێ و ڕۆنی بەسەردا دەکرێ.

**سایلێ** (هەورا.): هەڵوا.

**سایمە:** سایمەل.

**سایمەل:** نەخۆشییەکە لەمەڕی بدات گێژی دەکات وەکوو پەرکەم (فێ) بۆ منداڵ.

**سایی** (باک.): سایە، کەوای درێژ، ساهی. (باک.) شەوی ڕووناک.

**سایێقە:** سایەقە.

**سایگ:** سێبەر.

**سایین** (کە.، فە.): سوون، سوونەوە، سووین، تێهەڵسوون، لێخشاندن، پێدا خشاندن، ساوین.

**سە:** سەگ، سێبەر، نیسێ. (زا.) سێ.

**سەب** (باک.): کش، کڕ، هەو، ـــ ڕاوەستیایە: واتە کڕی کردوە، سەرمانەماوە، خۆش بووە.

**سەبا** (باک.): سەبارەت، لەبەر. سۆزی، بەیانی، سەوا. بای سپێدەیە، باییکە لە نێوانی ڕۆژهەڵات و باکووریدا سەرهەڵدەدات. ناوی جووره گۆرانییێکییە.

**سەبارەت:** ڕەوڕەوشت، خوو، شێوە. لەبەر، لەبەردڵێ . . . ، سۆنگە، هۆ، بۆنە، ـــ بە ناکۆکی ناوخۆییـیە، کە نەتەوەی کورد پەرت و بڵاو و دابەشکراو و ژێردەستە.

**سەبای** (هەورا.): سبەینێ، بەیانی.

**سەبای زوو** (هەورا.): سبەینێ زوو.

**سەبەتە:** سەوەتە، سەوی، (کە.، هەورا.) تووڵینە، ـــ ی نان: سەلە، نانەشات. دەفرێکی لە شووڵ دروستکراوە بۆ کاروباری ناومال و پەین ڕژاندن و میوەی تێدا دەبەنە فرۆشتنێ.

**سەبەتەسەرێ:** جوورە گەمەیەکە ئەوی تێبکەوێ داڎەنیشێ، یەکێکیش دەبێ بەوەستا بە ژوور سەریەوە پاسی دەکا، ئەوانی دی دێن لێی بدەن وەستاکەش نایەڵێ لەو کاتەدا دەستی وەهەر کامێکیان بکەوێ تێدەکەوێ.

**سەبەتەچن:** سەوەتەچن، کەسێکە سەوەتەی بچنێ و دروستی بکات.

**سەبەتۆڵکە:** سەوەتەی گچکە، زەمبیلە.

**سەبەقی** (فە.): سەراو، شۆرەکات، (سەراب).

**سەبەل:** جوورە نەخشێکە تووشی چاروێ دەبێ زێدە گۆشتی لێپەیدا دەکات.
(ئەردە.) سەبەل.

**سەبرگە:** ڕیخ و شیاکە، ڕیتاڵە.

**سەبرگەچی:** ڕیخ و شیاکە پاکەرەوە، ڕیخ و شیاکەرێژ.

**سەبزە:** سەوزایی، سەوزەواتێکە بە کاڵی یا بە کوڵاوی بخورێ، بەهەمەوو ڕووەکێکیش دەڵێن.

**سەبزی:** سەوزەوات، ئەسوور، تەراز، (باک.) دەرامەت، زرەزەڤات، پنجار.

**سەبۆ** (باک.): سەبۆنا، سەبۆنی، سەبارەت، لەبەر، سەبا، ژبۆ، ژبۆنا، ژبۆنێ، لەبۆ، لۆ.

**سەبۆنا** (باک.): سەبۆ.

**سەبۆنی** (باک.): سەبۆ.

**سەبوون:** گەرما، گەرمای تووش، ڕەشەبا.

**سەبوون** (ڕۆژ.): وورپە، هوورپە، (ڕۆژ.) سەبین، بای گەرم، گڕەبای گەرم.

**سەبیل** (هەورا.): سەبیلە.

**سەبیلە:** مرازێکە وەکوو سەبیلەی وایە ئەمسەرەو سەری بۆڕی ئاوێی پێ لێک قایمدەکرێ. سبیل، چتێکی ئەستوورو خووارە سەرێکی پردەکرێ لە توتن و ئاووری لە سەردادەنرێ و سەرەکەی تریشی بەزار دەکێشرێ وەکوو جغارە.

سەبیلە

**سەبیلەچی:** سەبیلەچی، کەسێکە سەبیلەی دروست بکات.

**سەبیلەخۆر:** سەبیلەکێش.

**سەبیلساز:** سەبیلەچی.

**سەبیلکێش:** کەسێکە سەبیلەی بکێشی.

**سەبین** (ڕۆژ.): وورپە، هوورپە.

**سەپان:** قەبارە، پاڵە، وەرزێر، کەسێکە دەغڵ و دانی بدرووێتەوە و بهێنێتە بەرهەم. (کە.) قۆچەقانی. ڕەنجبەرێکە بە پازدە یەک یا پترو کەمتر لەو ڕادەیە دەغڵی بدرووێتەوە و ڕەنیوی بێنێ بۆ خاوەندە کەی.

**سەپاندن:** دامەزراندن و جێگیر کردنی کەسێک یا چتێک لە شوێنێکیدا بە زۆر.

**سەپانی:** وەرزێری، پاڵەیی.

**سەپەت** (باک.): سەوەتە.

**سەپەک:** دارێکی پەنجەرەدارە بۆ سفتکردنی تنراوو چنراو لە تەونیدا بەکاردەبرێت. تێلاّ. سەولەی سەگی، کولێرەییێکە لە کەپەکی ناردی بۆ سەگ دروست دەکرێت.

**سەپەڵ** (ئەردە.): مەردومی سەپۆلە، چەپەڵ، سەرگەردان، گێل، ماڵوێران.

**سەپەلیک** (باک.): سیپەلاک.

**سەپک** (کە.): سەولە، کولێرەیەکە لە کەپەک دروستدەکرێ بۆ سەگ و ئاژاڵ و ڕەشەوڵاخ و وولاّخی بەرزە. تێلاّ، دارێکە وەک پەنجەی مرۆڤی دەواری پێدەکوترێ لە کاتی تەنینیدا بۆ سفتی.

**سەپڵە:** سەولە، جوورە کۆلێرەییێکە لە کەپەکی بۆ سەگان دروستدەکرێ.

**سەپۆڵە:** مەردومی گەلحۆی گێژوویژ.

**سەپوول** (ئەردە.): سەپۆڵە، سەرگەردان، حەپوول، چەلەنگ، سەپەڵ، پەخمە، گێج.

**سەت:** سەد (١٠٠) دە جاران دە.

**سەتەک:** گیایەکی بەهارییە بەرێکی بە هێشوو دەگرێت دەنکەکانی وەکوو نۆکی وایە تام و بۆنی خۆشە.

**سەتی:** کەسێکە لە بەر زۆر خووێندن یان لەبەر زۆر سەر ئاوێژرانی سەری گێژ و وورپوویێ.

**سەترە** (کە.، باک.): زللە، ـــ لێدان: زللە لێدان.

**سەترەنج** (باک.): شەترەنج.

**سەتک:** گیایەکی بەهارییە بەرێکی بە هێشوو دەگرێ و دەنکەکانی وەک نۆک وایە تام و بۆنی خۆشە.

**سەتڵ:** ڕزک، ساتل، ستڵ، (هەو.) پەقرەچ، ناڤدانک، (باک.) بێ دۆش، چەرت، ـــ ی جیل یا چەرم: دەولک، دەول، دەولوڤ، دەفرێکی قوڵفداری گەورەیە لە کان یا لە دار دروستدەکرێ بۆ ئاو و چتیتر.

سەتڵ

**سەتڵۆکە:** سەتڵی چکۆڵە.

**سەتماندن** (باک.): زارگرتن، زارنانەوەی شووشەو چتیتر، پرکردنەوەی بیر، وێرانکردنی شوێنێک، بسەقینە: زاری بگرە.

**سەتمە** (باک.): تا، نۆبەتێ. (زا.) ساتمە.

**سەتمین** (باک.): زارنرانەوە، زارگیران.

**سەتێ** (ئەردە.): ئەستێرە، ناوی ئافرەتانە.

**سەجەرە:** نەتەوەنامە، نەژادنامە، ڕەچەڵەکنامە.

**سەچتین** (زا.): پشکنین.

**سەحانی:** ڕاسقی، ڕازقی.

**سەحەری:** جوورە گۆرانییێکی کوردییە.

**سەحەن:** دەفرێکی مسینە وەک دەوری پەل وایە بەڵام قووڵترە.

**سەحەنچە:** سەحنی گچکە.

**سەحدی:** جوورە گۆرانییەکە، هەوایەکی گۆرانیشە بە بلوێرو شمشاڵی لێدەدرێ.

**سەحکردن** (زا.): گوورێگرتن.

**سەحلەب:** گیایەکی کوێستانییە بنەکەی وەدەست و پەنجەی مرۆی دەچێ.

**سەخەری** (ئەردە.): پێستی کەفەڵی گاو گامێش وولاخی بەرزەیە بنی پێلاوی لێ دروستدەکرێ.

**سەخەل** (باک.): منداڵ، پس، زگ، ـــ بوون: ئاووس بوون.

**سەخبێر:** گومرک.

**سەخبێری:** ناوچەی گوومرگ.

**سەخبیر** (باد.): بۆتەدان، دەربەست، خەمخۆر، ئاوورلێدەرەوە.

**سەخبیری** (باد.): دەربەستی، خەمخۆری، ئاوورلێدانەوە، لەبێ ـــ هۆتۆی بسەرهاتووە: لەبەر بێخەمخۆری وای بەسەرهاتووە.

**سەخت:** قایم، پتەو، مەحکەم. سفت، (ئەردە.) سور، توند. ڕەق، سەخت. دژوار، دژ، ئاستەم، خنس، (ئەردە.) دوخشار، سەخت. ڕێگای چەتوون، (ئەردە.) سەخناخ، ڕێگای ـــ: ڕێگای بەردەلان. سەرماوسۆڵە، تەووژمی سەرمایە. تووڕە، قەڵس.

**سەختان** (ئەردە.): (ئەردە.) سەخناخ، چەقێن، زریان، چەقەن، کێو و زورگی سەخت.

**سەختەگرێ** (ئەردە.): کوێرەگرێ، گرێکوێرە، گرێ پووچکە.

**سەختەوبوون** (ئەردە.): ڕەق بوون، تووڕەبوون.

**سەخت بوون:** تووڕەبوون، ڕەق بوون، پتەوبوون.

**سەختکردن:** تووڕەکردن.

**سەختی:** کۆتەک، پچر پچر، پچڕپچڕ، پێسیر، دژواری، چەتوونی، توندی. سەخڵەتی، تووشی، تەنگانە، تاڵی. ڕەقی، پتەوی، دژی نەرمی. ساردی، تەووشک.

**سەختیان** (هەو.، ڕەوا.): شەقە بە چەرمی خۆشکراو، کەوڵی خاراو، کە بۆ قۆندەرە و پۆتێن و چەکمە و چتیتر بەکار دەبرێ، شەقەچەرم. (کە.، هەورا.) کەوڵی ئەنگوتک لە سەرگرتنێ، کەوڵی نانکردنێ، دۆڵە.

**سەخردان** (هەورا.): کەوڵی نان، سفرە.

**سەخری** (ئەردە.): پێستی کەفەڵی وولاخان، کە دەباغکرابێ.

**سەخلاو:** دەستە پێشمەرگەیێکە، کە بۆ کێشک لە شوێنێکی بمێننەوە.

**سەخڵەت:** تەنگاو، ناساز، سەغڵەت، سەختی، تاڵی.

**سەخڵەت بوون:** تەنگاوبوون.

**سەخڵەتکردن:** سەغڵەتکردن.

**سەخڵەتی:** تەنگاوی، تەنگانە، سەختی، دەردەسەری، سەغڵەتی.

**سەخمە** (باد.، ئامێ.): دیواری بەردینی سنووری زەوی و پارچەزەوییانە. (باد.، ئامێ.) بە هەموو دیوارێکی وا دەڵێن، کە بە وروشکە بەردان دروستکرابێ. (باک.) چوو ار چێوەی کەرەستەی تەونییە. (باد.) دارێکی درێژە، کە سەرەکەی چەند لکێ وەبەر مێوی دەدرێ.

**سەخناخ** (ئەردە.): بڕوانە: سەختان.

**سەخوڕ:** ڕیخی ئاورزگی ئاژاڵانە. (کە.) سیخوڕ، ڕیخۆڵەیێکی پڕلە پیسایییە و فڕێ دەدرێ، پیسایی نێووورگ.

**سەخوڕدان:** سیخوڕدان، توورەکەیەکە لە نێورزگی ئاژاڵاندا پڕەلە پیسایی، وورگ.

**سەخوڕگا:** سەنیرگا، سیخوڕگە، شوێنێکە سیخوڕی لێ فڕێ دەدرێ، سەرگووێلک، سەوورگا.

**سەخوڕمە** (ئەردە.): سیخورمە، نقوورچک.

**سەد** (باک.): سەدەجووت. سەت = ۱۰۰ تیپی (د) ە، کە لە زۆرترینی خاکی پاکی کوردستانیدا (کرک) گۆی بە (ت) بە. سەد (۱۰۰) دە جاران دەیە، ناوی ژمارەیەکییە، کە پێنج جار بیستە. ـــ توخمە: سەدڕەگ. ـــ ڕەک: بیژوو، زۆڵ، سەدتوخمە.

**سەدا:** دەنگ. ـــ ی با: هاشە، ـــ ی پا: خشپە، خشپ. ـــ ی دار: ، شنەک ـــ ی. شیر: نەڕە. ـــ ی مەل: جیکەجیک، ـــ ی هەور: شریخە، گرمە، بۆڵە.

**سەدان:** ئەو ژمارانەن، کەلە خانەی سێمیندا دەنووسرێن. چەند سەدێک لە چتێک، چاپخانەی کوردستان چەند سەد پەرتووکێکی چاپکردووە.

**سەدانی:** تیرەیێکی جافە.

**سەدە:** سەدساڵە، (باک.) بابەلیسک، چەرخ، چەخێکە لە نێوانی سەدساڵاندا.

**سەدەجووت:** (موک.) سەری هۆگانێ، پارچە زەوییەکە دەکێڵرێ و دەکرێتە چەند بەشێک، سنووری هەر پارچەی یابەشەی: سەدە جوتێکە، جووت لەسەدەکەی دەگەڕێتەوە بە پارچەکانیش یەک یەکە دەڵێن سەدە. هەر سەدەجوتێکیش دەکرێتە دەلات، هەرلاتێکیش دەخەتە.

**سەدەف:** قالک، چتێکی سپی و سەختی بریقەدارە دوگمەر کەل و پەلی دیکەی لێدروستدەکرێ.

سەدەف

**سەدەم:** چتێکە بەندیواری بسەتەوبێ. (زا.) لەبەر.

**سەدەمین:** چتێکە یا ژمارەیەکە بەبێ کەم و کووڕی لەپلەی سەتەمدابێ.

**سەدپەلک:** گوڵێکی تۆپی زەرد و زلە.

**سەدری:** باشترینی برنجانە دەنکی باریک و درێژکۆڵەیە و تام و بۆنی ئێگجار خۆشە.

**سەدساڵ:** سەدە، چەرخ.

**سەدمێر** (باک.): هاواڵ، هاوکار، هەڤپا، بەشدار، هاوبەش. ـــ ی: هاواڵی، هاوکاری، هەڤپایی، بەشداری، هاوبەشی.

**سەر:** (هەورا.) زەبەر، بزیوەیەکە لەسەر پیتی ئارەوی دادەنرێ وەکوو دەبینرێ لەسەر پیتەکانی (م، د) مقدم. لا. سەرەوە، لای ژووروو، لای هەرە ژووروو، وە ـــ خستن: بردنەسەر. جار، چەل: سەرێکی چوومە لای بارامی لەماڵ نەبوو. بان: سەرچاو: بان چاو. هێندێک، ئەندازەو بەشە ئاوێکە، کە کشت و کاڵی پێ ئاودرێت: گۆلەکە سەرێکی ئاوهەیە. گەورە، سەردار، سەرلەشکر. سەرپۆش، سەرمەنجەڵ، سەرمێز، سەری شووشە،

زارەوانە. یەکەم، بەرایی. کێو، چیا، شاخ، لەسەران: لەسەرسەران، لەسەران هەوروبایە: لەسەرکێوان هەوروبایە. نووک، کۆتایی، بنەبان. گەیاندنەسەر: کۆتایی پێدان. کەس، تاقە گیاندارێک. سەلک، سەلک، کەللە، سەرک، کەللەی سەری گیان لەبەران، بەچک، بەسەربردن: ڕابوواردن، بە ــ دادان: دانەسەر، لەسەری خۆدان، بە ــ چوون: بوواردن، بەهەڵەچوون، جووڕیان، لەبیرچوون، بە ــ چوون: تێپەڕین، بە ــ داساخکردنەوە: شانەی ڕووشەوگێچەڵ و بەدناوی لەسەرداشکاندن، بە ــ داچوون: تێپەڕینی کات بەسەر شتێکدا. بە ــ ڕۆییشتن: ڕووالەتکردن، بە ــ داهاتن، بە ــ هاتن: دیواری ڕووشە و گێچەڵ و نەگبەتی و کارەسات بە سەردا ڕووخان، ــ م لەڕێدایە: ئامادە و گوێدێرم بۆ هەموو ڕاژەیێکی، تاسەر: هەتاهەتایە، هەمیشە. لە ــ : لەمل، لە ئەستۆ، لەگەردەن، لە ــ داشکاندن: بەسەرداساخکردنەوە، لەسەرکردنەوە: لەسەرهەڵدان، لە ــ ڕۆییشتن: درێژەپێدان، ڕاڤەکرن، لەسەریە: ناچارە، گەرە کە لەسەری، ــ لێدەرچوون: زانین، شارەزابوون، تێگەییشتن، ــ لێدەرکردن: زانین، تێگەیشتن، ــ لێ شێوان: ژڕێ شاشبوون، سەرلێ شێواندن: ژڕێ شاشکردن، لە ــ سەروچاوان: بەچاوان، لەسەرسەران خووە یڤین، لسەرێ گەڕاندن(باک.): لەسەرگێڕان.

**سەرا**: کۆشک، تالار. خانوو، ماڵ، کاروانسەرا. قشڵەی میری خانووبەرەیێکی گەورەیە، کە فەرمانبەرانی دەوڵەتی کاروباری میری تێدا هەڵدەسووڕێنن.

**سەراپاگشت**: هەموو، تێکڕا، سەراسەر، سەرانسەر، لە سەرەتاوە تا بنەبانێ، سەرتاپا.

**سەرا**: چیایەکە کەرتۆتە باشووری ڕۆژهەلاتی ڕەواندزێ.

**سەراپەردە**: پەردەیێکە بە دەرگای سەرایەو ژووری گەورە پیاواندا بگیرێ. بارەگا.

**سەراپیتە** (ڕەوا.): میچی خانووان، بن میچ. جێگایەکی کەمێک بڵندە لەسەر دیواران، کە کاریتەی لەسەر دادەنرێ.

**سەراجە** (هەو.): برینێکی پیسە لە چوار پەلی وولاخان دێت هەرچەندێکی چاکرێتەوە هەر هەڵدەداتەوە و بنەبڕنابێ.

**سەراچە**: بارەگای گچکە، قشڵەی گچکە. دەستە خانووبەرەیێکی گچکە.

**سەڕاد** (زا.): سەرەد، کەری دابێژتن.

**سەرارو**: سەرئاراو، کەف و سابووناوێکە، کە یەکەمین جار چتمەکی پێ بشۆرێ.

**سەراسا**: لە ئەندازە بەدەر.

**سەراسەر**: سەرانسەر، سەرتاسەر.

**سەرئاش بنتەلاش**: سەرپەڕۆ، بن پووش، سەران ناوی گوندێکییە لە سەر چیایەکیە.

**سەران**: چیایان، سەرەوەی چیایان.

**سەرازا**: ئازاد، سەربەخۆ. ــ یی: سەربەخۆیی.

**سەراسا**: لەئەندازەبەدەر.

**سەراسەر**: سەراپا، بەتەواوی، سەرتاپا، لەسەرەوە تا دوواییی.

**سەراسووێ**: گوورێبان، سەراسوو، سەرەتاتکێ.

**سەراسووی**: بەدزیەوە سەربردنە پێش بۆ تەماشا و بیستنی دووانی کەسێکیتر تا لە ڕازی ئاگاداربێ، (کۆ.) سەرتاتکە، ــ کردن: ئاووڕ لێدانەوە، سەر خوودارکردنەوە، سەردان.

**سەراسێ** (ئەردە.): سەرئێشە: دراوسێ لە دراوسێ دەگری سەراسێ، دەردەسەری.

**سەراسیمە**: سەرگەردان، سەر لێ تێکچوو، سەرسووڕماو، واق، هاژوواژ، دەسە پارچە، دەمەق.

**سەراسیمەبوون**: سەرگەردان بوون.

**سەراسیمەکردن**: سەرگەردان کردن.

**سەراسیمەیی**: سەرگەردانی، سەر لێ تیکچوون، واق ووڕی.

**سەراف**: سەراو، کەنار ئاو.

**سەراک**: سەرۆک.

**سەراکەرە**: سەراورە.

**سەرئاڵقە**: چتێکە سەری بە ئاڵقەبێ، سەرحەلقە: چتێکە بە سەری ئاڵقەیێکییەوە بکرێ، کەسێکە لە سەرەتای ڕێزو چینێکی دابێ.

**سەرامەد**: مرۆڤی قاڵی دەر هاتوو و ووریا.

**سەران**: سەرەوەی چیایان، تۆقەسەری کێوان، چیایان، کێوان.

**سەڕان** (کە.): زەڕینی کەر.

**سەرانە**: زێرەسەر، باج، خەراج، (باد.) خووک، قوربانی سەر، باجێکە لەم و لەو دەستێنرێ لە جیاتی سەری خۆی، ــ ی مرۆو مەڕو ماڵاتان.

**سەرانەستاندن**: سەرانە ئەستاندن.

**سەرانەدان**: سەرانە دانەدەست.

**سڕاندن**: زەڕاندن.

**سەرانسەر**: سەراسەر، لەمسەرەوە بۆ ئەو سەر، سەراپا. تووێژاڵی سەرەوەی چت، سەرانسەری ماستەکەم خووارد.

**سەرانگا**: لای سەری.

**سەرانگایی**: بەرایی، پێشایی، لە پێشدا، واژی دووانگاییە.

**سەرانگرێ**: هەڵەنگووتن.

**سەرانگرێ بوون**: هەڵەنگووتن، کەوتن و تەقڵەلێدان.

**سەرانگرێ کردن**: خستن، هەڵەنگاوتن.*

**سەرانگووێلک**: سەرگووێلک، گووفەک، زبڵدان، زبڵگە، سەرانگۆلک، سەرە توووێلک.

**سەراو**: سەراف، دەستمێز، ئاودەست، ــ ی چکۆڵە، ــ ی گەورە. سەرەتاو یەکەمین ئاوێکە بە جۆگەدا بڕوات. سەرچاوە، سەرچاوکەی ئاوێ، کانی. توورەکەیێکی پڕ لە ئاوە منداڵیشی تێدایە لە نێو زگی ئافرەتان و هەموو گیان لەبەرێکیدا، کە دڕا و ئاوەکەی لێ هاتە دەرێ نیشانەی بوونی منداڵەکەیە دەڵێن ــ ی تۆقی. هەڵمی ئاو، سەراب، شەبەقی ئاوێ.

**سەراوەرد**: سەراورد.

**سەراوتۆقین**: تەقینی ئەو پەردەیەیە، کە لە ناو زگی ئافرەتی ئاووسداو منداڵی تێدایە، کە ئاوەکەی هاتەدەر نیشانەی منداڵ بوونە.

**سەراورە**: سەراکرە.

**سەراوورد**: سەربردە، سەربەوورد، بەسەرهات، سەرەتا و بناوانی هەموو چتێک. لای ژووررووی هەموو چتێک.

**سەراوژێر**: سەرەوژێر.

**سەراوژێربوون**: سەرەوژێربوون.

**سەروژێرکردن:** سەرەوژێرکردن.

**سەروکۆشک:** خانووبەرەییێکی ڕێک و جوان و گەورەی سەرۆک و میران.

**سەروگەر** (ئەردە.): گڕاو، گەڕاو.

**سەرومیری** (هەورا.): سەرا، سەرای میری.

**سەرهاتن:** بەسەرهاتن، هەنگامە. بەسەرداهاتن، تووڕەبوون، ئالۆزبوون.

**سەرای:** سەرا.

**سەرایدار:** کاروانسەراچی. ـــ ی: کاروانسەراچێتی.

**سەرای شایی:** دەرباری پادشای.

**سەرای میری:** دەرباری پادشایی.

**سەرئەژمێر:** سەرژمێر. ـــ ی: سەر ژمێری.

**سەر ئەستوون:** سەرە کۆڵەکە، کاریتە.

**سەرڕە:** پڕیسکە.

**سەرڕەسەر:** زەڕەزەڕی کەرێ.

**سەرە** (باک.): سەر، نیوەپیر، بەنێو ساڵاندا چوو.

**سەرەناز:** سەرپۆش.

**سەرئەنجام:** ئەنجام.

**سەرئەنداز:** سەرپۆش.

**سەرنێش** (کورد.): دەندە.

**سەرنیشان:** سەریشان، سەرنێشە، نیشانی سەر.

**سەر نیشاندن:** مەبەس لە سەرکردنە سەر یەکێکی ترە.

**سەرنێشای** (هەورا.): سەرنێشە.

**سەرنێشە:** سەرێشە، ژانەسەر.

**سەر نێلچی:** باڵیۆز.

**سەر نێوارە:** ئێوارە، سەرەتای شەوی.

**سەرە:** گای ـــ: گایەکە لە گێرەیدا لە پەرگەی بێ. گوێزێکە لە جیاتی مەرمەڕی گەمەی پێدەکەن. نۆبە، نۆرە: ـــ م هاتووە. بالق. مرۆی نەزۆر گەنج و نە زۆر پیر، لەناوەوە چوو.

**سەرە** (هەورا.): زەڕەی کەرو ئێسترانە.

**سەر:** ژنێکە کردارو ڕەووشی وە پیاوان بچێ، کوڕانی.

**سەرەب** (باک.): (باک.) سەلین.

**سەرەبزووت:** بزووتی ئاگر.

**سەرەپا** (فە.): سەروپێ.

**سەرەپاکەت:** ئەو ئاسنەیە، کە چەند فیشەکێکی تێدا ڕێکدەخرێ.

**سەرەپەت:** سەرپەت، سەرڕشتە، کاروکردار، مەبەس لە کارو کردارو فەرمانە، ـــ یکی بەدەستەوە نییە: هیچ کارو فەرمانی نییە.

**سەرەت** (کە.): جێبەجێ کرانی کاروبارە.

**سەرەتا:** پێشەکی، پێشگۆتن، پێشگۆتنگ، دەست پێکی، بەر، پێش خەبەر، ڕچ، بەربێژ، پێشەنگ، بەرژەنگ، پێشڕۆ، دیباچە، پێشڕەو، بەرایی. سەرنامە، ـــ ی بەفروبارانە.

**سەرەتان:** پارچەییێکە لە کەرەستەی تەونی لە سەرەوە بەنی تەونی پێ قایم دەکرێ.

**سەرەتانکێ:** سەرەو خوارکردنەوەی سەرە، مەبەس لە تەماشاکردنی چتێک یاکەسێکییە.

**سەرەتایی:** بەرایی.

**سەرەتەشی:** (کە.): کەللەی دووک، سەرێکی دارینی گردی ئەستوورە بە سەری کلکە تەشییەوەیە بۆ تەشی ڕستن.

**سەرەتیر:** پەیکان.

**سەرەجە** (باک.): تابووت. (ئەردە.) ئەسپە، سووریژە، سۆرکە، سووریجە، هەشینۆک، سۆرک، سووریژەی ئەسپی. (باک.) نەخۆشی و دەردێکە لە پێش گوێ و لاسەرێکی دێ لە پاشان لە پژملی یا لە نزیک گوێی لە لای سەرەوە خڕی دەکاتەوە، کەدەربێ نامرێ، (موک.) گوێ ڕەپە.

**سەرەجەبە** (کە.): سەرەپاکەتی فیشەکانە.

**سەرەچەرمی** (هەورا.): بەربووک.

**سەرەچڵۆسک** (هەورا.): بزۆت، سەلکەبزووت.

**سەرەخەر:** مرۆی لاسار، بێ گوێ، خۆسەر، پێخەف، لێفە، پۆشن. (ئەردە.) داهۆڵ.

**سەرەخەر:** مڵۆزم.

**سەرەخەری:** لاساری.

**سەرەخۆ:** سەرەوخووە، سەرخووە، بونیەچاک، تەندروست، لە ـــ: پشوودرێژ، خۆڕاگر.

**سەرەخۆرە:** شووم، کەسێکە شووم و نەگریس بێ، منداڵێکە لە دووای بوونی کەسێکی نزیکی مردبێ. ـــ یی: شوومی.

**سەرەخۆشی:** بانگ، (دزە.) پرسە، بنهاری. ـــ کردن: پرسەکردن.

**سەرەخوڵی:** سەرەسوورە، نەخۆشییەکە سەری مەردوم گێژ دەکات.

**سەرەد:** سەرەند، (دەر.، کە.) سەرەن، سەراد، بێژنگ.

**سەرەدار** (ئەردە.): سەردار، بەشی سەرەوەی داری.

**سەرەدەر لێکردن:** شارەزابوون، سەرلێ دەرکردن.

**سەرەدۆر** (باک.): نۆبە، نۆرە، ـــ کردن: نۆرەکردن.

**سەرەدووک** (کە.): سەری تەشی، سەلکەتەشی.

**سەرەدووک:** بەرە تەشی.

**سەرەڕا:** سەریارە.

**سەرەڕای ئەوە:** لەگەڵ ئەوەش.

**سەرەڕم:** سەرەڕمب.

**سەرەڕمب:** سەرەڕم، ئاسنێکی درێژکۆڵەی نووک تیژو لە سەری ڕمبی دەخرێ.

**سەرەڕۆ:** کەسێکە بە بێ ئامانج و مەبەس سەری خۆی هەڵگرێ و بڕوات، گەڕیدەی بێ ئامانج، (هەورا.) سەرڕۆ.

**سەرەڕێ:** چەقی ڕێگا، ڕێباز.

**سەرەڕێگە:** بەرەگە، سەرەڕێ.

**سەرەزمێر:** (باک.) سەربژێر. ـــ ی: سەربژێری.

**سەرزمێری:** سەرزمێرە.

**سەرەژن:** ژنی لە ناوەوە چوو، لەسالاچووەچوو.

**سەرەژێر:** سەرەوژێر.

**سەرەسەرنیان** (ئەردە.): سەرنانە سەر یەکێک، تووتانن، وەقسەهێنان، سەر خستنەسەر کەسێکی تا بدوێ.

**سەرەسۆدرە:** پنەپیتۆ، پیرە پتۆن، زۆرزان، منداڵی قسە زل.

**سەرەسووڕێ:** سەرە سووڕە، گێژی، سەرە خولێ، دەردی سەر.

**سەرەشکێنە:** لابردنی سەری فەردە تووتن و ڕێکخستنەوەی، دووبارەکردنەوەی کارێک، کە لە پێش کرابێ بە سووکتر لە جاری پێشوو.

**سەرەشۆرکا:** سەرشۆرکە، سەرشۆرک.

**سەرەشۆرکە** (هەورا.): سەرشۆرکە.

**سەرەفراز:** سەربڵند، جوورە خشڵێکی نافرەتانە، لەم بەیتانەدا دەڵێ: دوڕ و یاقووت و مەرجان سەرەفرازە هەتاشاشان.

**سەرەفرازی:** سەربڵندی.

**سەرەفڕاز** (باک.): سەرهەوراز.

**سەرەقەننە:** سەرسەبیلە، کەللەی قەننە.

**سەرە قۆڵ:** سەری قۆڵ.

**سەرەک:** سەرۆک، سەردار. چتێکە مەلەوان لە ناوێدا بەسەریدا بپەڕێتەوە. دارێکی درێژە چەند مەلۆیەک گزرە گیای پێ هەڵدەگیرێ.

**سەرەک کۆمار:** سەرکۆمار. ــ ی: سەرکۆماری.

**سەرەک وەزیر:** سەرووەزیر.

**سەرەکۆی** (هەورا.): هەوراز، ئەرواز.

**سەرەکۆیی:** هەورازی.

**سەرەکوتێ:** لە سەرو گوێلاک دان، بە کوتەکوت ڕۆیشتن.

**سەرەکێتی:** سەرۆکێتی.

**سەرەکی:** سەرداری.

**سەرەکیتی:** سەرۆکایەتی.

**سەرەگها** (باک.): نەرم وباریک، شل، شلک.

**سەرەگێجە:** سەرەخولێ.

**سەرەگێجێ:** سەرە گێجە.

**سەرەگێژە:** سەرەگێژکێ.

**سەرەگێژکێ** (کە.): سەرەگێژە، سەرسووڕ خواردن.

**سەرەلوو:** جوورە قەرە لوویەکە.

**سەرە لووێنک** (بەرزنجە.): سەرگوێلک.

**سەرەلی** (باک.): نهۆمی سەرەوە.

**سەرەمیسی** (ئەردە.): بای سوور(دەردێکە).

**سەرەمەتە:** سەرماهە.

**سەرەمەرگ:** سەرەمێرد، گیان کەنیشت، ناوزینگ، هەوزینگ، ناوزینگان، ناویلکە، کاتی گیانەڵلا.

**سەرەمقەست:** برشتی کالاَیەکیە، کە لە کاتی برینیدا پەیدا دەبێ. سەرە پارچەی هەڵوایەکە بە مقەست دەبردرێ، مەبەس لە ناخونکە.

**سەرەمر** (ئەردە.): سەرەمریشک.

**سەرەمڕ** (ئەردە.): هەمیشە، هەموو ڕۆژێ، بەبێ پسانەوە. (هەورا.) هەمیشە.

**سەرەمریشک:** سەرەمر، سەرەمل.

**سەرەمژانە:** ئاسنێکی دەم پەلە لە سەر مژانە دەخرێ لە کاتی جووتکردنیدا دەمی گاسنی پێ خاوێندەکرێتەوە.

**سەرەمێرد:** پیاوی گەراوەوە و لە نێوەوە چوو.

**سەرەمێوژە:** جوورە مارێکی ڕەشە سەری وە دەنکی مێووژی دەچێ.

**سەرەن:** سەرەند.

**سەرنا:** ناوسار، سەرناوسار.

**سەرەناز، سەرەنناز:** سەرپۆش.سەرەنداز، جوورە مافوورەیەکە یا لبادێکی زۆر درێژو تەسکە.

**سەرەناسار:** چەقەنەی ئاشی.

**سەرەنەر** (ئەردە.): سەربەرەوخووارە.

**سەرەنجام:** ئەنجام، کۆتایی کار، دووایی.

**سەرەند:** کەوی دانەوێڵە پێدا بێژتنێیە یا هەر مرازێکی گێچ و زیخ و چەوی پێدا بێژرێ.

**سەرەنداز** (ئەردە.): لاکێشێکە لە ژوور قاڵییەوە ڕادەخرێ، لەسەر باری پانی سەرپۆشێکە بەسەر چتیدا بدرێ.

**سەرەنگا:** سەرین.

**سەرەنگرێ:** گیاندارێکە بە سەردا کەوتبێ. تووشی کارەسات و چوورتم هاتن. سەرسم، سەرمەقولات، ساتمە.

**سەرەنگرێ بوون:** بەسەرداکەوتن و ڕەهێڵ بوونی گیاندارێک، دوچاری کێشەر کارەساتێک هاتن.

**سەرەنگرێ دان:** ڕەهێڵکردنی یەکێک، دووچارکردنی کەسێکی بەسەر نێشەیەک.

**سەرەنگۆ:** سەرنخوون، سەرنیگوون، سەرەوژێر بوون یا ڕۆییشتن.

**سەرەنگیا** (ئەردە.): سەرەنگا، پاڵشت، بالین، سەنیر، سەرین، بالیف.

**سەرەنناز:** سەرەنداز.

**سەرەو:** لای سەرەوە، (جا.) کەوانە، ژووروو، ژۆر، ژوور.

**سەرەو:** سەکوەر.

**سەرەو ئەوە ڕووتیا:** سەرتاووسی، سەر ڕووتاوە.

**سەرەوار:** پایە دارێکی بەرزی سوپاییە.

**سەرەوە:** سەروو، ژووروو، لای سەرەوە، سەولێ.

**سەرەو خووار:** سەربەرەو، دەمەو خووار، بەرەو خووار، بەرەوژێر، (باک.) سەرنشێو،(باک.) بار، (باک.) ملک، سەربەرەوخووار.

**سەرەوخووارە:** سەربەرەوخووارە.

**سەرەوخوواربوون:** سەربەرەوخووار بوون.

**سەرەوخوواربوونەوە:** سەربەرەوخوواربوونەوە.

**سەرەوخووارکردن:** سەربەرەوخووارکردن.

**سەرەوخووارکردنەوە:** سەربەرەوخووارکردنەوە.

**سەرەوخوواری:** سەربەرەوخووارە.

**سەرەوژوور:** بەرەژوور، بەرەژۆر، سەربەرەوژوور، دەمەوژوور.

**سەرەوژوورە:** سەربەرەوژوورە، دەمەوژوورە.

**سەرەوژووربوونەوە:** سەربەرەوژووربوونەوە.

**سەرەوژوورکردنەوە:** سەربەرەوژوورکردنەوە.

**سەرەوژێر:** سەرەوخووار، نشێو، سەرەو لێژ، لیوی، پەلەواژ، بەرقەوژێر، سەرنشێو، کۆپلانە، سەرانکۆ، سەربەرژێر، سەراوژێر، بەرەو خووار، بەرەژێر، بەرەوژێر، سەربەرەوژێر، سەربەرەوخووار.

**سەرەوژێرە:** سەربەرەوژێرە.

**سەرەوژێربوون:** وەرگەڕان، داگەڕان، شەختین، هاتنە خووار، سەربەژێربوون، چوونە خووارەوە، هاتنە خووار، سەربەرەوژێربوون.

**سەرەوژێربوونەوە:** سەربەرەوژێربوونەوە.

**سەرەوژێرکردن:** کۆپلانەکردن، داگەڕاندن، هێنانە خووار، شەختاندن، وەرگێڕان.

**سەرەوژێرکردنەوە:** وەرگێڕان.

**سەرەوکار:** سەروکار، کاروبار، برژ بۆ ـ ی خۆت.

**سەرەوکاری:** سەروکاری، سەرپەرشتی کردنی کارێک.

**سەرەوگرد:** گەورەیەکە هەتیوێکی بێ بسپێرێ، کە چاوەدێری بکات تا گەورە دەبێ.

**سەرەو لێژ:** سەرەوژێر، سەربەرەوخووار.

**سەرەولێژە:** سەربەرەو خووارە.

**سەرەولێژی:** سەرەولێژە.

**سەرەوناو:** دەستەو ناو.

**سەرەوناوە:** دەستەوناوە.

**سەرەونخوون:** دەمەونخوون.

**سەرەونخوون بوون:** هەڵگەڕانەوەی قاپ یا مەنجەڵ و ئامانێکی و بەدەم داکەوتن.

**سەرەونخوونکردن:** قلپ کردنەوە، وەرگێڕان، هەڵگێڕانەوەی دەفرە بە سەردەمیدا.

**سەرەونگوون:** گیاندار یا چتی بێ سەروشوێنە.

**سەرەونگوون بوون:** بێ سەرو شوێن بوون.

**سەرەونگوونکردن:** بێ سەرو شوێنکردن.

**سەرەوێژ:** سەرەوژێر.

**سەرەوێر:** پارچە خامێکی چوار گۆشەیە بەسەر هەوێریدا دەدرێ.

**سەربار:** سەرەڕا، سەرڕا، دەرف، ناوبار، دەردو خەفەتێکە لە ژووروی ڕەنج و تەرکی جەرگبڕدابێ، ئەو کەلوپەلەیە، کە لە سەرباری دادەنرێ، نێوبار، هەرچتێکی لە نێوانی دوو تاسی باری دابنرێ سەرباری پێدەڵێن.

**سەربارانە:** باجێکە لە باری وەردەگیرێ.

**سەربارە:** سەرەڕا، دەرف، سەرڕا، سەربار.

**سەرباز:** هەیتە، پێشمەرگە، کەسێکە چەکدار کرابێ بۆ پاسی نیشتمان، (کوردی کۆن) مفردی.

**سەربازخانە:** شوێنێکە، کە سەربازی میری تێدا جێگیر بێ.

**سەربازکاری:** ڕاژەی پێشمەرگەی.

**سەربازگە:** سەربازخانە.

**سەربازگیری:** گرتنی لاوانە بۆ ئەوەی ببنە پێشمەرگە.

**سەربازی:** پیشەی پێشمەرگەی.

**سەرباس:** باسێکە، کە لێی بدوێن.

**سەربال:** پەرە گەورەکانی سەربالی باڵندانە، سێ شاپەڕی گەورەیە بەسەر باڵی باڵندانەوە.

**سەربان:** بان، دیوی سەرەوەی بانی یا ڕووی سەرەوەی بانی.

**سەربە:** دەستە، لەمەڕ، ئاشنا، دۆست، دارا ـ فیسارکەسییە، دەستەی وییە یا ئاشنای وییە.

**سەربە بەرد دادان:** سەرلەبەرد دان، پەشیمان بوونەوە.

**سەربەتاک** (دەر.): سەرئاوەڵە، سەر بەرەڵا، سەربەتاڵ.

**سەربەتاڵ:** سەرئاوەڵە، بێ سەردار، بێ خاوەند، بۆ ئافرەتی بێکەس و بێمێرد بەکاردەبرێ.

**سەر بەتاڵی:** بێ سەرداری، بێ کەسێتی.

**سەربەخۆ:** ئازاد، سەربەست، بسەرخووە، خۆبیو، خووەسەر، سەربەربوو، بۆ کەسێک یا نەتەوەیێک بەکار دەبرێ، کە ژێر دەست نەبێ، خۆسەر، ڕاستەوخۆ، لەخۆڕا.

**سەربەخۆیی:** خۆبیوون، سەربەستێتی، خووەر، خۆسەری، بسەر ئازادی.

**سەربەدەرەوە:** ناودار، بەناوبانگ، کەسێکیشە، کە هاتوچۆی دەرەوە زۆر بکات.

**سەربەدۆ:** دۆبەسەرە (گیایەکە).

**سەربەدوو:** چێشتی دۆینە.

**سەربەدووکە** (کۆ.): گیایەکی کێوییە گەڵای وەهی کاهووی دەچی، دەخورێ و تامیشی وەکوو وی وایە.

**سەربەرازدەی** (هەورا.): سەر هێنانەدەر.

**سەربەران** (ئەردە.): سەربڵند.

**سەربەرەخووار:** سەربەرەوخووار.

**سەربەرەخووارە:** بەرەوخووارە، سەرەوخووارە، لێژایی.

**سەربەرەژوور:** سەربەرەوژوور.

**سەربەرەژوورە:** سەربەرەوژوورە.

**سەربەرەژێر:** سەربەرەوژێر.

**سەربەرەژێرە:** سەربەرەوژێرە.

**سەربەرەوخووار:** بەرەوژێر، سەربەرەوژێر، سەربەرەوخووار، بەرەوخووار، چتێکە سەری کەوتبێتە خووارو خۆشی کەوتبێتە سەرەوە. سەرەوخووار، دەمەوخووار، دەمەونخوون، قلپ.

**سەربەرەوخووارە:** سەربەرەخووارە.

**سەربەرەوخوواربوون**: دەمەوژێربوون.

**سەربەرەوخوواربوونەوە**: لە شوێنێکی لێژدا بەرەوخووار ڕۆیشتن.

**سەربەرەوخووارکردن**: سەرەوژێردانان، دەمەوژێرکردنی چتێک، قڵپکردنەوە.

**سەربەرەوخووارکردنەوە**: چتێک لە سەرەوە بۆ خووارەوە ناردن، سەربەرەوخووارکردن.

**سەربەرەوژوور**: شوێنێکە، کە بەرزبێ و لە ژوورووی تۆوەبێ، شوێنی هەوراز.

**سەربەرەوژوورە**: بەرەو هەورازە.

**سەربەرەوژووربوون**: بەرەو هەوراز ڕۆیشتن، چوونەسەر.

**سەربەرەو ژووربوونەوە**: بەرێگایەکدا لە خووارەوە بۆ سەرەوە ڕۆیشتن.

**سەربەرەوژوورکردن**: بۆ هەوراز ڕەوانە کردن.

**سەربەرەوژوورکردنەوە**: ناردنی گیان لەبەرێک یا چتێک لە خووارەوە بۆ سەرەوە.

**سەربەرەوژێر**: سەربەرەوخووار.

**سەربەرەوژێرە**: سەربەرەوخووارە.

**سەر بەرەو ژێر بوون**: سەربەرەوخوواربوون.

**سەربەرەوژێربوونەوە**: سەربەرەوخوواربوونەوە.

**سەربەرەوژێرکردن**: سەربەرەوخووارکردن.

**سەربەرەوژێرکردنەوە**: سەربەرەوخووارکردنەوە.

**سەربەرەوژێرگە**: سەربەرەو ژێرە.

**سەربەربوو** (دزە.): ئازاد، سەربەست.

**سەربەردا** (باک.): گێژ. ــ یی: گێژی.

**سەربەردووکە** (کۆ.): گیایەکی کێوییە گەڵای وەهی کاهووی دەچێ دەخورێ و تامیشی هەر وەهی وی دەچێ.

**سەربەرز**: سەر بڵند، ڕووسوور، ئابڕوومەند. ــ بوون: سەربڵند بوون. ــ کردن: سەربڵندکردن.

**سەربەرزکردنەوە**: دووبارە سەرهەڵدانەوەی کاروبارێک، دوژمنان سەریان بەرزکردەوە.

**سەربەرزی**: سەر بڵندی.

**سەربەرژۆر** (باک.): سەرەوژوور.

**سەربەرژۆری**: سەرەوژووری.

**سەربەرژێر** (باک.): سەربەرەوژێر، سەرەوژێر.

**سەربەرژێری**: سەربەرەوژێری.

**سەربەرکەرەدەی جە نەوەشی** (هەورا.): سەر لە نەخۆشی دەرکردن.

**سەربەرزێر** (باک.): (باک.) سەربەرەوژێر.

**سەربەس**: سەربەست، ئازاد، کەسێکە لە هیچ سڵ نەکا و شەرم نەکا.

**سەربەسە**: سەربەستە، مۆر کراو.

**سەربەسەر**: سەرەوسەر، (باک.) سەربسەر، بەقەد یەکتری، گۆڕینەوەی دوو چت بەیەکتری بەبێ باقی دانەوە.

**سەربەسەرە**: گانگۆڕکێ، سەربەسەرێ.

**سەربەسەرێ**: یەکتر ناموسبردنی دوو نێرینانە، گانگۆڕکێ، سەربەسەرە.

**سەربەست**: نێوی پیاوانە، ئازاد، ئازادە. ئازا، ئازاسەر، بەزات، زاتدار، بێ پێشگر.

**سەربەستە**: مەبەس لە چتی شاردراوەوە و داپۆشراوە.

**سەربەستبوون**: ئازاد و ڕزگاربوون.

**سەربەستکردن**: ئازاد و سەربەخۆکردن. نرخێکی زۆر دانانە لەسەر چتێک تا خاوەنەکەی دەستخەڕۆ بیێ و لەو نرخەی کەمتر نەفرۆشێ و دابمێنێ بە دەستییەوە.

**سەربەستن**: سەرپێچان. سەری کارو فەرمانێک خستنە دەست.

**سەربەستێتی**: ئازادیتی.

**سەربەستی**: ئازادی، سەربەخۆیی، ئازاسەری، بەجەرگی، نەترسان. سەربەسی. شەرم و سڵ نەکردن.

**سەربەسی**: سەربەستی.

**سەربەش**: شرە، میرات، پاشماک. بەشێکی سەرپشکە لە ناو چەند بەشێکیدا لە چتێک.

**سەربەفتارەتدان**: تووشکردنی یەکێک بە کارەسات و چورتمێکی وا، کە سەری تێدا بچێ.

**سەربەکڵاوە**: گیایەکە. کڵاوەسەر، بارانەییکە، کە دەکەوێتە سەرزەوی وەکوو کڵاوەو سەربە گۆیکەیە، جارجارە بەفریشی لەگەڵە.

**سەربەگۆبەند**: سەربەگێچەل.

**سەربەگێچەڵ**: سەربەگۆبەند.

**سەربەلگ** (باک.): گەڵای چکۆڵەی توتنییە.

**سەربەمۆر**: سەربەستراوە، مۆرنەشکاو، قوتوو یا شووشەییکە، کە پڕ بێ لە چتی بەنرخ و سەرەکەشی مۆرکرابێ.

**سەربەن**: سەربەند. (زا.) چەرمی سەر پەنجەی (نەعل)ە.

**سەربەند**: سەربەن، سەرەتای هەڵبەستێکە لە پارچە هۆنراوەیەکیدا، تاکە هۆنراوەییکە، کە لە حەوت بەندانددا دووپاتە بکرێتەوە.

**سەربەهەش**: سەربەخم، سەربەتیل. ــ ی: سەربەخمی، سەربەتیلی.

**سەربەهەوێ**: هەوێدار، ژنێکە هەوێی هەبێ.

**سەربدەو** (باک.): چێشتێکە لە ساواری یا لە گەغە کوتاو و ماشی دروست دەکرێ.

**سەربڕ**: بکوژ، کوژەرەوە. ڕێگایەکە ڕێگای درێژو دوور کورت بکاتەوە، قەدبڕ سا لە دەشت یا بەسەر گرد و کێواندا تێپەڕێ.

**سەربڕاو**: سەر ژێکراو، گیاندارێکە سەری لە لەشی جووێ کرابێتەوە.

**سەربردە** (دزە.): سەراوورد، سەرگوزەشتە، بەسەرهات، سەربوواردە.

**سەربردن**: بەسەربردن، بە ئەنجام گەیاندن.

**سەربڕکردن**: بەسەرگرد و کێودا ڕۆیشتن.

سەبرگە، پیخ و شیاکە. ــ چی: کەسێکە پیخ و شیاکە خاوێن کاتەوە و فڕێی بدا.

**سەرپڕیاگ**: (ئەردە.): سەربڕاو، سەرژێکراو. سەر هەڵپاردراو، سەربڕاو (بۆ سەری لق و پۆپی داران) دەڵێن.

**سەربڕین:** لە گەروودان، سەرژێکرن، سەر لە لەش جوودا کردنەوە، لە گەردەن دان. ـــ ی قەڵەم: پێنووس دادان.

**سەربزێو** (باک.): چێشتی نیسک و ساوارییە.

**سەربزێو:** سەرکێش، دەست بزێو، جەربەزە، هاروهاج. ـــ ی: سەرکێشی، دەست بزێوی، جەربەزەیی، هاروهاجی.

**سەربست** (باک.): گۆچان، داردەست.

سەربست

**سەربستوو:** کەل، بورج، برج. کۆنگرە.

**سەربڵن:** سەربڵند.

**سەربڵند:** سەربەرز، ڕووسوور، کەسێکە کەم و کووڕی و نەنگ ڕووی تێ نەکردبێ. ـــ انە: سەربەرزانە. ـــ اهی: سەربڵندی. ـــ کردن: سەرهەڵێنان، بەربەرەکانی کردن. سەرکێشی کردن، چاوهەڵبڕین. ـــ کردنەوە: سەربەرزکردنەوە. ـــ یتی: سەربەرزیتی. ـــ ی: سەربەرزی، بێ نەنگی.

**سەربڵنی:** سەربڵندی.

**سەربندۆ:** کێشە.

**سەربۆر** (کە.): پیسکە، ڕژد، ڕیشوو. (کە.) ـــ ی: پیسکەیی، ڕژدی. (باک.) ـــ ی: یادگار.

**سەربۆز:** کەسێکە تووکی سەری ڕوو لە سپێتی بکات. ـــ ی: سپێتی تێکەوتنی تووکی سەروریشی مرۆڤانە.

**سەربووارده:** سەربردە، بەسەرهات.

**سەربوون:** پیربوون، ڕوو لەپیری کردن، بۆ هەموو گیان لە بەرێکی بەکاردەبرێ.

**سەربهوورد** (باک.): سەربردە، بەسەرهات، بەسەرات.

**سەربهی** (بار.): داستان.

**سەربێژ:** سەرگری ئاژاڵان بۆ بێژی، ئەو کەسەیە سەری ئاژاڵان بگرێ تا بێری بیدۆشێ.

**سەربێشکە:** پەردەیێکە بەسەر لانکی منداڵاندا دەدرێ، سەرلانک.

**سەربێموو:** سەرتاووس، تاس، سەرتاس.

**سەربێن:** سەربەست، بەن یا پەتێکە سەری چتی پێ ببەسترێ، دەرخۆنە، سەرپۆش.

**سەربی** (باد.): جوورە هەرمێییەکە، کرۆسکە ڕەقەی کێویلکەیە.

**سەربیان:** سەرکۆمار.

**سەربیانی:** سەرکۆماری.

**سەربیینەک:** (باک.) سەڵەندە، بان، سەربان.

**سەرپا:** ڕاوەستاو، قیت، بەرپا.

**سەرپاتە** (دزە.): تڵتە (نی هەر چییەکی بێ).

**سەرپارچ:** دروونەوەی گیایەکە، کە لە ناو مەرەزەدا ڕوو ابێ و کەوتبێتە سەر مەرەزەکە. دروونەوەی سەرلکی مەرەزەیەکە (قەرقۆ) واتە زۆر هەڵستابێ تا نەکەوێتە ناو ئاو و بزرێ.

**سەرپارێزەر:** بەرەوان.

**سەرپاس:** گوێ پێ نەدراو، خراوە پشت گوێ.

**سەرپاک:** هەموو، تێکڕا، سەرتاپا، سەراپا، گشت. ـــ ی: تێکڕایی، گشتی.

**سەرپاڵان:** سەرکورتان، سەرجل.

**سەرپاڵە:** سەرژکی پاڵە و سەپانانە، کەسی یەکەمین لە دروێنەکاران، سەپانێکە لە کاتی دروێنەدا وەپێش سەپانەکانی تر بکەوێ.

**سەرپاهاووردن** (ئەردە.): سەرهاووردن.

**سەرپایی:** سەرپێ یی، ڕەوانی، زگچوون، ـــ کردن: زگچوون.

**سەرپایین:** سەربەرەوخووار. ـــ ی: سەربەرەوخوواری.

**سەرپەت:** سەرەپەت. ـــ ی: بەخشندە، سەرپەتی، دەسواز، دەسباز. سەرڕووت.

**سەرپەڕ:** سنوور. وێنە، شکڵ، نیگار. چتێکە لەوپەڕی چەند چتێکی ترەوە بێ. باشترین و چاک و بەرزترین. کەنار، قەراغ، لەلێواری هەرە دوایی، (کۆ.) سەرپەرگ. لای هەرە سەرەوە و ژوورەوەی کۆڕ، لە ـــ ی کۆڕ (مجلس) ی دانیشتووە. گاجووتێکە لە گێرەدا لە پەڕی دەرەوە بەسترابێتەوە لەرێزی گێرەدا.

**سەرپەرچەم** (بابا.): جوورە چەکێکی ژنانەیە بەسەر پەرچەمی دادەکرێ.

**سەرپەرس** (ئەردە.): نۆکەر.

**سەرپەرست:** سەرپەرشت، سەرپەرشتیار. ـــ ی: سەرپەرشتی، بەرچاوکردن.

**سەرپەرستیار:** سەرپەرشتیار. ـــ ی: سەرپەرشتیاری.

**سەرپەرسی:** نۆکەری.

**سەرپەرشت:** سەرپەرس، سەرپەرست، کەسێکە چاودێری چتێکی بکات، ئاگادرای کاروبار، بەڕێوەبەر. ـــ ی: سەرپەرسی، سەرپەرستی، دەهەم، گەرانۆک، چاودێری، ـــ کردن: سەرپەرستی کردن.

**سەرپەرگە:** پەرگە.

**سەرپەل:** تووتن دوو جوورەگەڵای هەیە: سەرپەل و بنپەل. سەرلکی داران و گیایان.

**سەرپەڵ** (هەو.): هەوەڵ پەڵەیە.

**سەرپەڵە:** مانگی تشرینی دووەم، کە سی ڕۆژە.

**سەرپەلکی** (باک.): دەمەکی، ڕووکاری دەرەوە.

**سەرپەڵۆ:** ڕاپەڕین، پەلەڕۆیشتن، بەهەشتاوی دەرپەڕین، بەپەلە، بەتاڵووکە. ـــ یی: بە هەشتاوی ڕۆیشتن و دەرپەڕین.

**سەرپەنجە:** نووکی پەنجان، جومگەی یەکەمی پەنجانە. پەنجە، بەسەر نووکی پەنجە بەسەر خاکدا ڕۆییشتن.

**سەرپڕ:** سەرقاڵ، پڕکار، کار زۆر، سەرجەنجاڵ. دەفرێکە لێواولێو پڕبێ لەچت. ـــ ی: سەرقاڵی، پڕکاری.

**سەرپزوو** (بابا.): پزوو، پزی، شووێنی دۆخینە لە دەرپێ و پانتۆڵ و ڕانک دا.

**سەرپشک:** بەشکار، کەسێکە بەشان دابەشێ. تەرخان، ناقبر، یەکەمین کەس. چتێکی زۆر باشە و لەناو چەند چتێکی تردا، کە پشک ناوێژرابێ و وەبەر یەکێکی کەوتبێ. ـــ ی: بەشکاری، تەرخانی.

**سەرپل:** زۆر تووڕە، تونەو تیژ، زۆر قەڵس. چەکێکە زیتکەی شل بێ و زوو بتەقێ.

**سەرپۆت:** کردنی کارێک بە ناپوختی، ـــ یێک تووتنەکەم دارک بژێرکرد.

**سەرپۆتک:** سەرڕشتە، نوویشک.

**سەرپۆرت** (ئەردە.): سەرپۆت، سەرسەری.

**سەرپۆش:** چتێکە سەری چتان داپۆشێ، سەراشمە، سەرگوو، سەرگووش، سەرگۆشە. دەرخۆنە، دەڤک، دەرمانک، دەم تاخن بۆ سەرنانەوەی دیزە و کووپە و مەنجەڵ و چتی تر. ــــ ی ژنان: (بادـ.) بنکووچک، (کە.) پێشتەماڵ، ڕووپۆش. مرازێکە لە کەرەستەی جەنجەڕی. سەرپۆشی کورسی و مێزو قەنەفەو ئیتر. چارشێو.

**سەرپۆشنانەوە:** داپۆشین.

**سەرپۆشیدە:** سەرپۆشراو.

**سەرپۆل:** میوەیێکە بە سەر لقە زۆر بڵندەکانی دارانەوەبێ.

**سەرپووت:** کارووپیشەی نیوە چڵ.

**سەرپوورت** (باک.): بزنێکە تووکی تێکچرژاو و ڕەق و سەخت و بوورو تاریک بێ.

**سەرپێ:** بەسەر پێوە، کەوتنە سەر پێیان، هەستان و بەرز بوونەوە سەر پێیان.

**سەرپێچ:** شاشک، چتێکە لە سەر ببەسترێ، پێچی سەر، مێزەر، مەندیل.

**سەرپیچ:** سەرکێش، شۆڕشەوان، ملهوڕ.

**سەرپێچان:** سەرپێچی، شۆڕش، بەزاج، لامۆفەک، سەرکێشی. چت لە دەوری سەر ئالاندن.

**سەرپێچانەوە:** سڵەمینەوە و کۆکردن، دارا لە هیچ چتێک سەرنا پێچێتەوە واتە کۆناکات.

**سەرپێچی:** خۆدزینەوە لە کارێک، سەرکێشی، سەربزێوی. ــــ کردن: سەرکێشی کردن.

**سەرپێداەنواندن:** سەرپێ نزم کردن، سەر پێ چەماندنەوە.

**سەرپێ سپاردن:** مەبەس لە دڵنیاییکی تەواوە، پشت پێ بەستن، بەتەواوی لە کاروکردەوەی کەسێکی دڵنیابوون.

**سەرپێشۆڕکردن:** سەرپێداەنواندن.

**سەرپێشی** (باک.): ئەوکەسەیە، کە سەری داوەتێ دەکێشێ، سەرچۆپی کێش.

**سەرپێکردن:** سەرلەسەردانان.

**سەرپێل** (باک.): سەرشۆڕ، شەرمەزار.

**سەرپێن** (کە.): سەرپان.

**سەرپێوەنان:** مەبەس لە مل لێنان و ڕاست ڕۆیشتنە، ئازاد سەری پێوەنا واتە ڕاست ڕۆیشت.

**سەرپێهاتی** (باک.): ڕووشە، ڕووداو، ــــ کرن: ڕوودان.

**سەرپێ پی:** لەپڕا، لەناکاو، لەنەکاو. گوزەران پەیداکردن بە بۆنەی هاتووچۆکردنی دەرەوەو سەرپێیان. سەرپایی، زگچوون، گووکردن. ــــ کردن: زۆرچوونە ئاودەست، پیسایی کردن، زگچوون، هام و شۆی ئاودەست کردن، زۆرجار چوونە سەر پێشاو.

**سەرپیر:** کەڵلەپیر، کەسێکە پیربووبێ و سەری سپی بووبێ. ــــ ی: بەسەری پیری.

**سەرپیل:** سەرشان.

**سەرپینی:** دەمی، دەمەکی.

**سەرت:** پتەو، قایم.

**سەرتا:** داوەبەنێکە بەزارکی جەواڵییەوەیە بۆ دروونی زارکەکەی. (باک.) لکی سەرەوەی داران. میوەیێکی جووانە لە سەر تا و سەوەتەی دادەنرێ.

**سەرتاپا:** سەرتاسەر، سەراپا، سەرانسەر، لەنووکەوە تادوایی، سەراسەر، بالاّ، (ئەردە.) ئەنام.

**سەرتاتکە** (کۆ.): سەراسووێ، گووێبان.

**سەرتاتکێ:** سەرخوارکردنەوە، تەماشاکردنی یەکێک.

سەرتاج

**سەرتاج** (باک.): تاج، تانج.

**سەرتاس** (فە.): سەرتاووس، تاس. سینی گچکە، کە لە سەرتاسی دادەنرێ.

**سەرتاسەر:** سەرتاپا، لەم سەرەوە تا ئەوسەر، سەرانسەر. ــــ ی: سەرتاپایی، سەرانسەری.

**سەرتاسمە** (کە.): سنووری پارچە زەوییێکی چکۆڵەیە.

**سەرتاش:** گووێزان و چەقۆی تیژ، کە سەر بتراشێ. تاشەر، سەرتراش، کەسێکە سەروڕیشی مرۆی بتراشێ، (باک.) پۆتقوت. ــــ ی: سەرتراشی.

**سەرتاشین:** سەرتراشین، پۆت قوتکردن.

**سەرتاق:** دارێکە بە سەر تاقەیدا ڕایەڵ دەکرێ تا دیواری لەسەر دروستکرێ. بەنێکە لە دەمی جەواڵ دەبەسترێ بۆ دروونی. (کە.) باڵە خانەیێکە لەسەردەرگا دروست بکرێ.

**سەرتاڵ:** سەری هەودای دەزوو و بەن.

**سەرتاڵەی بن شیرین** (بل.): پنچکە گیایەکە نێرتکەکەی بەژنێک بڵند دەبێ، سەرەکەی گوڵێکی تۆپی سپی خڕە، پەڕی گوڵەکانی درووبان پێوەیە، گیا و نێرتکەکەی تاڵە بەلاّن بنی گوڵەکەی زۆر شیرینە، کە پیر بوو ووشک دەبێ و دەبێتە دروو.

**سەرتاووس:** (لەک.) هەیهۆپ. ــــ ی: (لەک.) هەیهۆپی.

**سەرەتایی:** بەرایی.

**سەرتەرز:** تووڵەی هەرە ناسکی ڕووەکان.

**سەرتەریدە:** گەورەی جەردە.

**سەرتەزێن:** ئاو یا خواردنەوەمەنیەکی زۆر سارده سەر بتەزێنێ.

**سەرتەزین:** تەزینی سەر لەسەرمان یا لەبەر چتی زۆر سارد خواردنەوە.

**سەرتەشی** (باک.): زیندەوارێکە.

**سەرتەڵ:** نایاب، بژاردە.

**سەرتەندوور:** سەرتەنوور، شووێنێکە تەندووری تێدا دانرابێ بۆ نان تێدا کردن.

**سەرتەنگ** (کە.): گوریسی درێژە تەنگەی پێ دەبەسترێ لەسەربارەکەوە.

**سەرتەنوور:** مەبەق، جێگایەکە لەسەر تەندوور ڕێکخراوە بۆ دانیشتن و نان لەسەرکردن.

**سەرترنە** (هەر.): مرازێکە لە کەرەستەی جووتی.

**سەرتریانە:** سەلە.

**سەرتەگ** (باک.): سەرتیژ.

**سەرتل:** چتی نایاب و هەڵبژاردە.

**سەرتل** (باک.): سەرکڵاوە.

**سەرتلە** (ئەردە.): بژاردە، جیاواز، سەرگوڵ، سەرپشک، نایاب، دانستە، سەردەستە.

**سەرتلی** (باک.): سەرکڵاو.

**سەرتلیک** (باک.): ئەنگوستیلەی دروومانیّ. ڕەحەتی.

**سەرتۆ:** سەرتوویّ، سەرتوویّژی شیروماست.

**سەرتۆپ:** سەرەتای تۆپی کر و بزگوران، چەند قەدیّکە لە تۆپی تەنراو لەلای سەرییەوە، کە لەوانی دیکە باشترە. سەرگوڵ، بژاردە، سەرپەر. تیّکرا، هەموو، گشتی، سەرتۆپی قوتابیان چوونە باغان. ــ ی: هەڵبژاردەیی.

**سەرتونگ:** زارەوانەی تونگە، سەری تونگەی.

**سەرتوو:** سەرتوویّ، قەیماخ، سەرتۆژ، توویّژی قەیماخی، (باد.) توو، سەرتووی ماستی یا چیّشتی.

**سەرتوویّ:** سەرتوو، قەیماخ، تۆژ، سەرتۆژ، تۆ، توویّژی سەری ماست و شیری.

**سەرتوویّژ:** سەرتوویّ.

**سەرتوویّی سرکە:** بەڵخ، بەڵغ.

**سەرتوویّی شیر:** خامە، (ئەردە.) سەرشیر.

**سەرتوویی ماست:** (ئەردە.) تووژگ.

**سەرتیاچوون:** مەبەس لەمردنە لە پیّناوی هەر چتیّکیدابیّ.

**سەرتیّداچوون:** لە نیّوچوون، تیّداچوون.

**سەرتیّشت** (باد.): بەرچا، بەرقەنە، بەرچایی.

**سەرتیّکردن:** مەبەس لە هاتووچۆکردنە بۆ لای کەسیّکی: دارا سەری تیّکردووم. دم تیّنان: دارا دمی لەماڵی خۆی ناوە.

**سەرتیپ:** سەرۆکی تیپیّک پیّشمەرگە.

**سەرتیر:** لەماتیّنیدا، کە مەرمەری داویّن دەڵیّن وەزەوی نەکەوی ڕاستەو خۆ یەکسەرە بکاتە نیشانە جا لیّی بدات یا نا. ــ ی: جوورە دروومانیّکە، جووت باقیە.

**سەرتیکە** (سەق.): سەیدووکە.

**سەرتیل:** بەو گوریسانە دەڵیّن، کە سەریّکیان بەدەوارەوەیە و سەرەکەی تریان لە گوڵمیخ یا سینگی قایم دەکریّ.

**سەرتیلە** (دزە.): لەسەرەوەی دیواران جیّگای کاریتانە، کە کەمیّک بڵند دەکریّ.

**سەرتیلک:** سەرتلیک.

**سەرجەلە:** زنجیرەی پشتی باب و باپیران.

**سەرجەم:** تەواو، گشت، تیّکرا، گشتی، سەرجەم ئەو پەرتووکانە بە چەندی؟، بەدەستی گەل، (ئەردە.) بەکەمو.

**سەرجەنجاڵ:** خەریک، مژووڵ، کەسیّکە زۆر سەری قاڵ بیّ، پرکار. ــ ی: کاروبار، پرکاری.

**سەرجەنگ:** پیّشجەنگ، سەرهەنگ.

**سەرجل:** سەرپالاّن، پارچەییّکە لە هۆڕ یا قاڵی، پارچە چنراویّکە بە سەر کورتانی دادەدریّ تا درەنگ بدریّ یا لە کار بکەویّ. (باک.) سەرچڵ.

**سەرجۆش:** سەرکەف، سەرجەوهەر، ویّژە، ئاوارە، سەرپۆتک، نوویشک.

**سەرجیّ:** لەسەرجیّگا، پاڵ. ــ یی: لەپاڵدا.

**سەرجیّییکردن:** لەگەڵ خیّزانی خۆ نووستن، دروست بوونی پیاوە لەگەڵ ژنی خۆی.

**سەرچاف** (باک.): بەشیّکە لە ڕوو، کە کەوتۆتە نیّوەڕاستی دوواییی کەپۆ و نیّوەڕاستی نیّوچاوانەوە.

**سەرچاو:** سەرچەم، ــ ان: بەسەرچاوان.

**سەرچاوە:** چاوە، سەرووکانی، سەرچاوگە، پنار، کانی، جیّگای لیّ هەڵقوڵانی ئاوێیە، چەشمە، سەردەرخستنی ئاوی کاریزە، دەنگاڵە. بنیات، چاوگە.

**سەرچاوکە:** سەرچاوگە. پەردەییەکی تەنکە بە سەرلانکیّ یان ڕووی منداڵان دادەدریّ.

**سەرچاوگە:** سەرچاوە، کانی، سەراو. سەرچاوکە، ژیّدەر.

**سەرچەسپ:** بەتاقە.

**سەرچەشمە:** سەرچاوە.

**سەرچەم:** بەسەرچاوان. سەرچاوکە. سەرشیو، کەنار، شیو.

**سەرچەمە** (هەورا.): سەرچاوە، کانی.

**سەرچەوت:** قەرزکوویّر، ناڕاست، کەسیّکە مافخۆریّ و قەرزان نەداتەوە، پەیمان شکیّن. ــ ی: ناڕاستی، قەرزکوویّری، بەڵیّن شکاندن.

**سەرچڵ:** سەرپۆپەی داران و گژ و گیایان. سەرسەری، هەڵەشە، ڕەمەکی، تووڕە. بیّ گوویّ، جەربەزە، مرۆڤیّکە دووارۆژ نەیەنیّتە بەرچاوی خۆی. خۆدەرخەر. ــ ی: سەرپیّچی، کەللەڕەقی.

**سەرچنار:** هاوینە واریّکە لە نزیک شاری سلیّمانی.

**سەرچنگانە:** لەسەردەستان بە ڕیّگایەدا ڕۆیشتن.

**سەرچۆپی:** سەرهەڵپەڕ، سەرپیّشی داوەتیّ، هەڵپەڕینیّکە لەسەر پەڕی لای ڕاستی داوەتیّوە ڕیّز بگریّ. ــ کیّش: ئەو کەسەیە، کە لە لاپەڕی ڕاستی داوەت یا ڕەشبەڵەکیدا هەڵپەڕیّ. ــ کیّشان: لە لای ڕاستەوەی داوەت یا ڕەشبەڵەکیدا هەڵپەڕین.

**سەرچۆکهاتن:** بەسەرچۆکدا هاتن، لە سەر چۆکان دانیشتن.

**سەرچووزەڵە** (شا.): چووزەڵە.

**سەرچوون:** کوژران، مردن، تیّداچوون. تیّپەڕینی سەر، تەواوبوون، بەپایان گەیشتن، بە ــ : بەهەڵەچوون.

**سەرچینە** (دەر.): چیلکە، چۆپی. (ڕەوا.) لق و پۆپی ئەو دارانەیە، کە بۆ فرۆشتن یا دارەڕایەلیّ دەکریّنەوە و فڕیّ دەدریّن.

**سەرچیچک:** گۆی مەمکی.

**سەرچیچکان** (هەورا.): هەڵتەرووشکان.

**سەرحەد:** سنووریّکە، کە دووخاک یا هەریّمان لە یەکتری جوویّ بکاتەوە. ــ دار: کەسیّکە چاوەدیّری سنووریّکی پیّ ئەسپیّردرابیّ. ــ داری:

چاودێری کردنی سنوور. مارو زیندەوەرانی ژێرخاک، کە لە بەهاراندا دێنە دەرێ ـــ ی یان پێدەڵێن. ـــ دار: سنووردار، سنووروان، سەرپەڕدار.

**سەرحەساو:** سەرۆکی ئەژمارياری. ئاگادار، بەئاگا. ـــ بوون: ئاگاداربوون، ـــ کردن: ئاگادارکردن.

**سەرحەلقە:** سەرمەلا.

**سەرحورچنە:** پیرەباوە، گیایەکە وە گوویزبەلەی دەچێ بەلاّن بنەکەی لە هی وی خڕترە، پەلکەکانی کوڵکن و تۆزاوییە، بنەکەی بە پاکراوی دەخورێ.

**سەرخاسکەفتن:** لێهاتنی گەورەیی و پێشکەوتن.

**سەرخان** (ئەردە.): نهۆمی سەرەوە لە خانوو، نهۆمی دووەم، باڵەخانە.

**سەرخەرمان:** ئەو دەخڵە خاوێنەیە، کە لە سەرەوەی خەرمانێیە، دژی بن خەرمانێیە.

**سەرخەو:** کەمە نوستنێکە، کەمە چاوگەرم کردنێکە.

**سەرخەوشکاندن:** کەمێک نوستن، نەختێ چاو گەرم کردن بۆ حەسانەوە.

**سەرخەوکردن:** سەرخەوشکاندن.

**سەرخڕبوکەفتن:** سەربووچک کەفتن، ناشایان، پەست، نزم.

**سەرخستن:** پەڕاندنی وولاّخی نێرە لە وولاّخی مێ. زاڵکردنی یەکێک بە سەر یەکێکیدا یا بەسەر مەبەستێکیدا. وەسەرخستن، بردنەسەر، بان نیان.

**سەرخستنەسەر:** بەسەر ڕۆییشتن، سەرکۆنەکردن، سەرزەنشکردن، سەرنانەسەر. وەسەرخستن. داگرتن، بەقسەداگرتن.

**سەرخۆ:** لەسەرخۆ، ئارام، هێمن.

**سەرخۆش:** دڵخۆش، کەیفخۆش، پۆزبەران، لە شادمانی و خۆشیدابوون. مەست، کەسێکە بە هۆی ئارەق و مەی خواردنەوە بێ هۆش بووبێ.

**سەرخۆش بوون:** بێ هۆشبوون بە هۆی مەی و ئارەق خواردنەوە.

**سەرخۆشکردن:** مەست کردن.

**سەرخۆشی:** سەرەخۆشی. کەیفخۆشی. مەستی. ـــ کردن: دڵدانەوەی کەسێکی مردووی لێ مردبێ یا تووشی ڕووشەیێکی بووبێ.

**سەرخواردن:** مەبەس لە مردن یا کوژرانی یەکێکییە دووای پەیدابوونی کەسێکی، بارام سەری بابی خوارد. کشانەدوواوە، شکان.

**سەرخوراندن:** هەوەس و ئارەزووکردن. سەری خۆ بە نینۆکی خوراندن و کفت و کۆی خوران و خارشتێ دامرکاندن.

**سەرخورانن:** سەرخوراندن.

**سەرخووە** (باک.): بونیە چاک و ساغ و مەحکەم، لەسەرەخۆ.

**سەرخووەبوونا** (باد.): سەربەخۆیی.

**سەرخووەشی** (باک.): مەستی، سەرخۆشی. (دەر.) سەرەخۆشی.

**سەرخوران:** مەبەس لە شەڕخوازییە، هەمبەری. بۆ گچکان دەڵێن قوونی دەخورێ. مەبەس لە شەق ویستنە. بۆ گەوران مەبەس لە ڕووشە و زیان ویستنە.

**سەرخووینەک** (باک.): باڵندەیێکی چکۆڵەی بەرگەردەن سوورە.

**سەرخێڵ:** سەرۆکی عێل و خێڵەسات، سەرکۆمار. ـــ ی: سەرپەرشتی خێل و هۆزان.

**سەرخووەی** (ئەردە.): ساغ، تەندروست، لەسەرەخۆ.

**سەرد** (هەورا.): سارد، لە فێنکی پتر. مرۆی خاو لە کاروباردا.

**سەردب** (باک.): سارداو، ژێرزەمین، نهۆمی هەرەبنەوە، سارداو.

**سەردبەردە** (هەورا.): سەرمابردو.

**سەرداخانە** (ئەردە.): سزا و سەرانەی هەلاّتنی سەربازییە، کە لە خاوەند سامان دەسێنن.

**سەرداخستن:** مەبەس لە شەرمەزاری و تەریقییە، شەرمەساری.

**سەردار:** سەروەر، خان، سان، سەرەک، خشە ئیتە، هرار، گەورەی ماڵێ، سالار، سەرۆکی لەشکرو پێشمەرگە. مرازێکی تەونییە. نێوی پیاوانە. (باک.) کە داردەبڕێ بۆ فرۆشتنێ دەکرێتە ٣ پارچە، سەردار، ناڤدار، بندار.

**سەردارسپا:** سالار، سەرلەشکر، سەرۆکی لەشکر.

**سەردار لەشکر:** سوپاسالار.

**سەرداری:** سەرۆکێتی، سەروەری.

**سەردان:** دیدەنی، چوونە دیدەنی، چوونەسەرلێدانی، بەسەرکردنەوە، دیدەنی کردن، بەسەرکردنەوەی کەسێک یا چتێک، چاوپێ کەفتن، لاڕێیین، دیدەنی کردن. گووێزەمە. (باک.) سەرەخۆشی، چوونەپرسەوسەرەخۆشی. سەرلەپێناونان، سەرکردنەقوربان، تێداچوون، سەردانان. تەواوکردە، کۆتایی پێدان. بەرەلاّکردن، ناردن.

**سەردانان:** مل کەچکردن، گیان لە پێناونان، گیان بەخت کردن لە پێناو چتێکیدا، سەربەختکردن. خۆتێدا لەناوبردن، تێداچوون. خۆدانەدەست.

**سەردانەر:** خۆبەدەستەوەدەر.

**سەردانەواندن:** سەرشۆڕکردن. سەرنزم کردن، سەرهێنانەخووار.

**سەردانەوانن:** سەردانەواندن.

**سەرداندن** (باک.): لەسەرەد دان. بەسەردینە.

**سەرداو:** ژێرزەمین، ماران، سارداو.

**سەرداواردەیی** (هەورا.): بەسەرماکەوتن، سەرماخواردن.

**سەرداوێ** (باک.): ئەوسا، لەدووراییدا.

**سەرداهاووردن:** سەرداهێنان، سەری ئاخەفتن دامەزراندن. سەرشانەکردن.

**سەرداهێنان:** شانەکردنی تووکی سەر.

**سەردە با:** بای سارد.

**سەردەر:** دیدەنی کار، بەسەرکەرەوە. دالاّن، بێلایی، پێشدەرکە.

**سەردەرچوون:** مەبەس لە شارەزاییە لە هەر چتێکیدابێ: ئازاد سەری لە زۆر کاران دەردەچێ.

**سەردەرکەر:** شارەزا، بەڵەد.

**سەردەرکردن:** خۆ ڕزگارکردن لە کارەساتێک هەلاّتن، ڕەوین. لێ زانین، شارەزایی.

**سەردەرگا:** چەنددارێکە لەسەر دەرگایە ڕایەڵ دەکرێ و دیواری لە سەر دروستدەکرێ. ـــ نە: (دەر.) باندەرکە.

**سەردەرگە:** سەردەرگە.

**سەردەرهاتن:** مەبەس لە سەر دەرهێنان و سەوزبوونی گیایە.

**سەردەرهاووردن:** سەردەرهێنان.

**سەردەرهێنان:** سەردەرهاووردن.

**سەردەری:** پارچە پۆشاکێکە لەسەر جل و بەرگەوە لەبەردەکرێ.

**سەردەریا** (ڕەوا.): ڕێگایەکی باریکی دەستکردە لە هەورازێکی سەخت سەرکەوێتە سەرێ.

**سەردەس:** سەردەست.

**سەردەست:** سەرقۆڵی هەندێ پۆشاک. سەرپشکی. سەرکەوتن. (باک.) ـ کرن: دەرەقەتهاتن، شکاندن.

**سەردەستان:** کاتی زانی ئافرەتە، کە مامان لەسەردەستی خۆی دادەنێ، ساردەسنگان.

**سەردەستە:** سەرۆکی دەستە. سەردەست، سەرپشکی، تەرخان، نایاب، دانستە، هەڵبژاردە، باشترین.

**سەردەستان** (ئەردە.): هەڵامسان و ڕەق بوونی زگە لەسەرمان، دەردێکە.

**سەردەسێر:** کوێستان، سەرکاوان، ئێلاخ.

**سەردەشت:** شارێکە لە کوردستانی ئێران.*

**سەردەفتەر:** سەرنووسەر، سەرۆکی دیوان. یەکەمین ناو لە لزگە (لیستە) دا یا لەناو پەڕاو و پەرتووکدا.

**سەردەق:** مۆر، دەقی دەست لێ نەدراوی هەموو چتێک.

**سەردەقشکاندن:** مۆرشکاندن، مەبەس لە کردنی کارێکە یا لە هەڵدانی مەبەسێکە، کە هێشتا نەیکردبێ هەروەکوو بۆ ئامۆژگاری دەڵێن سەردەقی ئەم کارە یا ئەم مەبەسە مەشکێنە.

**سەردەلیا** (باک.): جوورە ماسییەکی دەریاییە.

**سەردەم:** کات، حەل، تاف، سەقامات، سووڕ، چەرخ، ڕۆژگار، گاڤ. سۆراخ، سەروەخت. ـــ ە: پارچە تەنراوێکی تەنکە لە ناو لانکیدا بەسەر دەمی منداڵاندا دەدرێ. ـــ ێ: ماوەیەکی، کاتێکی. ـــ ی: دەمەدەمی، کاتی.

**سەردەنشت:** سەرۆەنشت.

**سەردەوبوون** (ئەردە.): ساردبوونەوە. مەبەس لە مردنە. لەکارێکی ساردو پەشیمان بوونەوە، دووری کردن.

**سەردەوکردن** (ئەردە.): ساردکردنەوە.

**سەردەووس** (باک.): قوڵە، کورتکراوەوە.

**سەردەوسی** (باک.): ڕێ بڕین، کورتکرانەوە، قوڵەکردنەوە.

**سەردەهان** (باک.): پلەیێکی پۆلیس و عەسکەرییە: ئۆنباشی، چاوەش.

**سەردبیەی** (هەورا.): بەسەرماکوتن.

**سەردر:** شاگردانەی جۆلایانە. کری جۆلایانە، چتێکە مەردوم بە دەستی خۆی تەنیبێتی یا چنی بێتی دەڵێن: جۆلا بە ـــ ی خۆی قایل نییە. چتی خۆماڵی، بۆ وێنە: جۆلا بەسەردری خۆی قایل نییە. سەربەنی جۆلایی.

**سەردروو:** سەروەدروو، سەرەودروو، دروومانێکە لەسەرەوە بدروێ، کۆکی دروومان.

**سەردل** (باک.): ئاوات، مەبەس.

**سەردڵەمەنگین:** گرفت.

**سەردلکری** (باک.): ڕازاوەوە، گەوهەربەند.

**سەردڵ و سپڵ:** ئاوسانی زگ لەبەر سپڵ و نەخۆشیانی تر.

**سەردۆخە:** (ڕەوا.، خۆ.) پڕۆمژۆڵی گوڵی دەخلاتە، کە سەر لە کیفی دێنێتە دەرێ.

**سەردۆز:** کەسێکە سەرپشکنێ بۆ ئەسپییان. ـــ ین: سەرپشکنین بۆ ئەسپییان.

**سەردۆشەگ:** ڕوودۆشەگ.

**سەردۆشی:** وەسڵە، سەرشانی، پاگۆن.

**سەردۆڵە** (کە.): هەورازێکە سەرەولێژ بێ. ـــ(هەورا.) کەوڵی ئاردییەو نانی لەسەردەکەن.

**سەردۆڵیان:** ئەو شوێنەیە لە ناو ئاشیدا، کە دانەوێڵەی باراشی لەسەر ڕۆ دەکرێت بۆ هاڕینی.

**سەردۆم** (باک.): جوورە گۆرانییێکی داوەتییە.

**سەردۆوبندۆ:** خڵت و خەشی ماست و شیرە، کە لە قەراخ ڕۆنیدا دەمێنێتەوە.

**سەردۆوڵە:** کەوڵی نان لەسەرکردنێیە.

**سەردۆڵ:** کەوڵی نان لەسەرکردنێیە.

**سەردوور** (کە.): لەدروێنەدا تەنها گوڵێ دروونەوەیە و لاسک بەجێ هێشتنە.

**سەردووک** (پژ.): نێردیوان.

**سەردوگەرم:** ساردوگەرم، شیرەتین، شیلەتین.

**سەردوگەرمکردن:** شیرەتین کردن.

**سەردوولک** (هەو.، کۆ.): بەمەردووان هەڵکوتن. (هەو.، کۆ.) ـــ ە: ئەو وتارانەن کە لە پرسەی ژناندا سەردوولکەبێژ دەیلێ و ئەوانی تر بۆی دەگێڕنەوە، بەمەردووان هەڵکوتن، ئەوکەسەشە مردووان هەڵدەنێ.

**سەردوولکەبێژ:** دوولکەبێژ، ئەو ژنەیە بە مردووان هەڵدەڵێ لە پرسەی ژناندا بەچەند پێهەڵکوتنێکی دڵگیر و ژنەکانی دیکەش بۆی دەگێڕنەوە.

**سەردێر** (موک.): دەغڵێکە پێش پەڵە چاندرابێ یا درەنگ ئاودرابێ.

**سەردێڕ:** هۆگان، ئەو خەتەیە جووتی لێ دەگەڕێتەوە، (دەر.) سەرمەرز، (خۆ.) گاگێڕەوە.

**سەردی:** ساردی هەوا، ساردی ئاو و چتی تر.

**سەردین** (باک.): بەرهەمهێنانی دەخڵ و دان، بەردە.

**سەردی وەرز** (هەورا.): سەرماوەز.

**سەرڕاجە:** (کە.) سەرڕاجە، دەردێکی کوژندەیە تووشی وڵاخی بەرزە دێت.

**سەرڕافندن:** زەڕینی گوێدرێژە.

**سەرڕە:** زەڕەی گوێدرێژە.

**سەرڕا:** دەرف، سەربارە، سەرەڕا. ـــ ی ئەمە: سەربارەی ئەمە.

**سەرڕاست:** دەست پاک، شامبۆز، ڕاستکردار، ڕاستبێژ، پەیمان نەشکێن.

**سەرڕاستی:** دەستپاکی، شامبۆزی، ڕاستکرداری.

**سەرڕەسەر:** زەڕە زەڕی کەرێ یەک لە دووای یەکتری.

**سەرڕەش** (باک.): مەرێکە سەری ڕەشبێ.

**سەرڕەشە** (کۆ.، کە.): گیایەکە دەسکە کەوەر و ئیتری پێ دەبەسترێ.

(هەر.): مەڕێکە سەروملی ڕەشبێ و لەشی سپی بێ، بەڵان خاڵی ڕەشی لە لەشی دابێ.

**سەرڕەق:** سەرسەخت، بەدرەک، کەللەڕەق، ڕق ئەستوور، کەسێکە لە کێشی کەسدا نەبێ، سەرکێش. ـــ ی: سەرسەختی، کەللەڕەقی، تووڕەیی، ڕقەستووری.

**سەرڕەو:** ـــ ی ئاوێ، ـــ ی بارانە.

**سەرڕشتە:** سەرپۆتک، تووێشک، ئاوارە. توانا، شیاوی، لێهاتوویی، دەستەڵات.

**سەرڕشتە:** سەر ڕوشتە.

**سەرڕشتە:** بەڵگە، ـــ یەکی چتمەکە دزراوەکەم دەستکەوتووە. ژیری، ئازاد بە ـــ یە: ژیرە.

**سەرڕشتەدار:** لێهاتوو، توانا. ـــ داری: توانایی، لێهاتوویی.

**سەرڕوشتە:** سەرڕشتە.

**سەرڕووت:** سەرکۆت، سەرزەلووت، سەرقووت، سەرپەتی، سەرتاووس. ـــ ی: سەرکۆتی.

**سەرڕووتیاوە** (هەورا.): سەرتاووس.

**سەرزارەکی:** بەدەم، بەدەڤ، سەرزاری، مەبەسێکە هەر بەدەم بکوترێ و لەدڵ نەیەتەدەرێ.

**سەرزاری:** سەرزارەکی.

**سەرزەدە:** کەسێکە بێ پرس و پەروا بچێتە شوێنێکی یا هەڵبکوتێتە سەر فەرمانێکی. خشتێکە لە نیوەی کەمتر کەلبێ.

**سەرزەلووت** (باک.): سەرڕووت.

**سەرزەنش:** سەرزەنشت، بەسەر ڕێیشتن.

**سەرزەنشت:** سەرخستنەسەر، تازیر، بەسەر ڕێشتن، دەمکو.

**سەرزەنشتکردن:** بەسەر ڕێشتن، چەرقین.

**سەرزەوی:** سەرحەرد، بۆ مار بەکاردەبرێ، کە بەهاران دێتە سەرزەوی.

**سەرزەوین** (ئەردە.): سەرزەوی.

**سەرزڤرینەک** (باک.): سەرسووڕان.

**سەرزگ** (دزە.): لێفەی منداڵی نێو لانکێ. لەسەر، بۆ ئافرەت یا هەرگیان لەبەرێکی بەکاردەبرێ، کە لە سەرزمان بێ.

**سەرزووانخۆش:** سەرزمانخۆش، دووزمان.

**سەرزین:** چتێکی جوانی ڕەنگاوڕەنگە بەسەر قەڵتاغی زینیدا دەدرێ.

**سەرژان** (هەورا.): سەرکۆنە، سەرزەنشت.

**سەرژمار:** سەرژمێر.

**سەرژماردن:** سەرەژمێری، نووسین و ئەژماردنی سەری مرۆڤ یا گیان لەبەران بەگشتی.

**سەرژماری:** سەرژمێری.

**سەرژمێر:** سەرژمار، ئەوکەسەیە، کە سەران دەژمێرێ یا دەنووسێ.

**سەرژمێرە:** سەرژماردن.

**سەرژمێری:** سەرژمێرە.

**سەرژنانی:** نێرینەیەکە خوو و کرداری ژنانە بێ.

**سەرژێستاندن:** پێ لێ هەڵبڕین، پێدرێژی کردن.

**سەرسال** (باک.): سەری ساڵ، ڕۆژی بەرایی سەری ساڵێ، ئەورۆز. (زا.) ساڵیانە.

**سەرسام:** سەرسووڕماو، سەرمەند، کاس، وڕ، واق وڕماو. نێوی مرۆڤانی نێرینەیە. ـــ ە: نیشانەیێکی وایە: (!!!) بۆ واق وڕمانییە.

**سەرسامبوون:** پەشۆکان، قووڕسین، سەرسووڕمان، حەپەسان، کلمسین، واق وڕمان.

**سەرسامکردن:** قوورساندن، پەشۆکاندن، سەرلێ شێواندن، حەپەساندن.

**سەرسامی:** پەشۆکاوی، وڕی، حەپەساوی، سەرسووڕمان.

**سەرسەخت:** کەللەڕەق، سەرڕەق، گیاندارێکە بەکێش بێ. ـــ ی: کەللەڕەقی، سەرڕەقی، بەرگەگرتن و بەکێشی گیاندار.

**سەرسەد:** سەرەتای سەد. ـــ ە: (هەورا.) سەرهۆ، زەوی بۆ کێڵان، کە دەکرێتە چەند پارچەیەک، هەر خەتەی، کە سنووری هەریەک لە پارچەکانەو جووتی لێ دەگەڕێتەوە ـــ ی پێدەڵێن، ئەو بەندو بارەشی لەسەرە: هەموو ڕۆژێ گورگ بەسەرسەدەی فەرەیدونیدا ئاڕووا وا دیارە فەرەیدوون لە دەرفەتێدا سوودی نەدیتووە.

**سەرسەرپاد** (باد.): سەرکۆتەڵ، کارکۆتەڵی سەربێژنگان.

**سەرسەران:** بەسەرسەروچاوان.

**سەرسەران سەرچاوان:** بەسەرسەروچاوان.

**سەرسەرانێ** (هەر.): گەمەیەکی کوڕانە.

**سەرسەرەکی:** لێ نەخەفتان، خستنە پشتگوێ.

**سەرسەری:** سەرسەرێکی، بێ لێکدانەوە. گەمۆڕ، ڤڕفڕە، چالۆر، فلیتە، وازی وازی، مایەپووت، چەپک چەپک، دەمدەمی، بێ شەرم، تڕۆ، هیچ و پووچ، سەرچڵ، جینگەنە، بێ شێواز، حارەب گاگۆزی، بەدخوو، بەڕەڵا، بێ مووبالات. پەناستەم، کەمێک، ـــ پەرتووکەکەم خوێندەوە.

**سەرسم** (باک.): سەرسام، شێت، دین، مێخۆلی.

**سەرسەنگ:** کەمێک لە ئەندازەی خۆی پتر خستنە سەر چتێکی فرۆشراو و کێشراو سەبارەت بەدڵی کڕیار. هاوینەهەوارێکی زۆر خۆشە لەڕا ژووری موسل و نێو بادینانا.

**سەرسەودا:** سەرباقی، قازانج.

**سەرسووز** (هەورا.): سۆنە.

**سەرسپاردن:** خۆبە دەستەوەدان.

**سەرسپی:** (ڕۆژ.) پۆپ چەرمە. پیر بۆ ژن و پیاو. ژنی بەڕێز و ژیر و گەورە و بەمەشوور ئافرەتان پرس ورای پێدەکەن. (هەورا.) بارگەچییێ، ژنێکە بووکێ لە ماڵی باوکییەوە لەگەڵ خۆی دەباتە ماڵی زاوای و لەوێ ڕاژە (خزمەت) ی دەکات.

**سەرستوون:** سەرکۆڵ، سەرکۆڵەکە، تاجی سەر ئەستوندان. تەپڵەکی چادری.

**سەرسفتی** (هەورا.): سەرکاوەش.

**سەرسکلی:** ئەنگوتکە هەویرێکی پانکراوەوەیە، کە وەکو کولێرە لەسەر پشکۆ برژابێ.

**سەرسم:** سەرسمت. بۆ هەڵەنگووتنی وڵاخ بەکاردەبرێ، توێخ، ئەوچ، سەرەنگرێ. ـــ بردن: سەرسمدان، نووچبردن، پێ هەڵەنگووتن،

ساتمەکردن. ـــ دان: تۆبغدان، (کە.) هەڵکەوتن، هەڵنەگوتنی وولاخ، سەرسمداری.

**سەرسمداری** (هەورا.): سەرسمدان، هەڵنەگووتنی ئاژاڵ و ماڵات.

**سەرسنگ**: سەرسینە، بەرسینگ، جێگەی قەلادە.

**سەرسۆت** (باک.): سەلکە بزووت.

**سەرسۆتکە** (باک.): سەلکە بزووت.

**سەرسۆرە** (باد.): هەزارپێی سوور و گەورەیە.

**سەرسۆک**: کەمهۆش، بێ مێشک.

**سەرسۆنگە**: شێتیی، بە ناسوودەیی.

**سەرسووالگەر**: کەسێکە چاوی لە دەستی ئەم و ئەو بێت.

**سەرسووت** (باک.): سەرەبزووت.

**سەرسووران**: گێژی، گێژبوون، سەرخولانەوە، چاو رەشکەوپێشکەکردن.

**سەرسوورمان**: سەرسام بوون، واقمان، پەشۆکان، حەپەسان، سەرلێ شێوان، هۆت بوون، هیدمان، شاشبوون.

**سەرسوورماو**: سەرسام، واق وورماو، سەرمەند.

**سەرسووک**: بێ هۆش، بێ عەقل. بریتییە لە مەردومی بێکار و کەم نیش، دەست بەتاڵ. ـــ بوون: دەست بەتاڵبوون، لە کارو کردار رزگاربوون. ـــ ی: بێکاری، کاربڕان.

**سەرسینگە**: لێفەی گچکەی منداڵانە، کە لە نێو لانکێیدا پێدا دەدرێ.

**سەرشابەندەر**: باڵیۆز، نووێنەری دەوڵەتێکی لە شابەندەر گەورەتر لە پایتەختی دەوڵەتێکی تردا.

**سەرشاخ** (باک.): جوورە شووتییەکە. ـــ گرتن: سەربزێوی، سەرپێچی.

**سەرشار**: سەر ڕێژکردنی ناو. سەرۆکی شار، شارەوانی. شووێنێکی تایبەتییە لە یاری چاوشارکێدا، کە لە وێوە دەچن بۆ خۆشاردنەوە.

**سەرشان**: لەمل، لەئەستۆ. سەریاڵ و تەپەو کێوگرد. ئەندازەیەکە لەچت کە بەسەرشان هەڵبگیرێ: سەرشانێک کەنگر و کارگم بۆ هات. تۆشەبەرە، تۆشە، هەمبانە. ـــ ی: پاگوون.

**سەرشەقێن**: جوورێکە لە یاری شەقێن.

**سەرشەه** (باک.): شانەی سەری.

**سەرشتە**: سەلیقە.

**سەرشکاندن**: سەرشکانن.

**سەرشکانن**: سەرشکاندن.

**سەرشکێنە** (ئەردە.): سەرشکێنە، دابەشکردنی پاشماوەی چتێکی بەشکراوە بەسەر بەشەکاندا. دابەشکردن، پارە یا کەلوپەلێک بەسەر چەند کەسێکی دابەشینەوە، کە هەرکەسەی بەشی خۆی ببات، پارە یا هەر چتێکی تر هەر بەوشێوەیە لە چەندکەسێکی خۆیی کۆ و خڕکردنەوە.

**سەرشمە** (باک.): سەرپۆش.

**سەرشۆ**: سەرشۆر.

**سەرشۆر**: ئەوکەسەیە، کە لە گەرماوێدا سەری مەردوم بشوات، ناتری گەرماوێ. (باک.): گەرماو.

**سەرشۆڕ**: سەرنزم، چاونزم، شەرمەزار، تەریق، چاو بەرەژێر، بەخۆداشکاوەوە. ـــ بوون: شەرمەزاربوون، تەریق بوونەوە.

**سەرشۆرتکە**: شۆرتکە.

**سەرشۆرک**: گەرماوێکی گچکەی نێوماڵانە، (بار.) سەرشۆک، سەرشۆرکە.

**سەرشۆرکە**: سەرشۆرک.

**سەرشۆڕکردن**: سەرنزم کردن، شەرمەزارکردن، مەبەس لە بەدناوکردنی کەسێکییە.

**سەرشۆرگا**: گەرماو.

**سەرشۆری**: پیشەی سەرشووشتنێ، سەرشوشتن.

**سەرشۆڕی**: چاونزمی، سەرنزمی، مل کەچی، بەدناوی. گووێدێری، ملکەچی.

**سەرشۆک** (بار.): شۆرکە، سەرشۆرکە.

**سەرشوو** (باد.): سەرشۆرکە.

**سەرشێت**: دێوانە، مەردومی سەرلێ شێواوە. ـــ بوون: سەرلێ شێوان. ـــ کردن: سەر لێ شێواندن.

**سەرشێو** (ئەردە.): بەربانگ، بەرشێو. ـــ ان: سەر لێ تێکچوون.

**سەرشێواندن**: سەرلێ شێواندن.

**سەرشیر**: سەرتوو، تۆشک، تووشک.

**سەرشیشە**: سەرەشووشە.

**سەرشین**: شووم، دڵرەق، ماڵوێران، خۆشەویست لێ مردوو، لێقەوماو.

**سەرشیو**: قەراخ شیو و دۆڵ.

**سەرفەرمان**: بەرفەرمان، فەرمانی سەرەتایی. ـــ دار: فەرمانڕەوا. ـــ داری: فەرمانڕەوایی.

**سەرفلت** (کە.): دزێو، سەرزل، ناشیرین.

**سەرفیراز**: سەربڵند، سەربەرز.

**سەرفنچقە** (ئەردە.): سەری قامکان لەخنەگرتن.

**سەرفیرازبوون**: سەربەرزبوون.

**سەرفیرازکردن**: سەربەرزکردن.

**سەرفیرازی**: سەربڵندی.

**سەرفینچقە** (ئەردە.): ئەنگوستیلەی دروومانێ.

**سەرقاپ**: سەرپۆشی قاپ. ـــ نانەوە: سەرپۆش لە سەرقاپ دانان.

**سەرقاڵ**: سەرپڕ، پڕکار، خەریک، بەژارە زۆر، کەسێکە لەبەر پڕکاری نەپەرژێتە سەر هیچ چتێکی تر. ـــ بوون: سەرپڕی، پڕکاری. ـــ کردن: سەرشێواندن لە یەکێک بە سەرخستنەسەری. ـــ ی: سەرپڕی، سەرقاڵبوون.

**سەرقەبلاندن**: هەندێک ئازووقە بە هەژاران دان بە نیازی (سەر فیترە) لە جەژنەی ڕۆژووەندا.

**سەرقەپاخ** (توو.): سەرقاپ.

**سەرقەل** (ئەردە.): قوللەپۆپە، لووتکەی شاخ و درەخت.

**سەرقەڵەم**: سەرنووسەر، سەرۆکی نووسەران. نووکە قەڵەم. ـــ انە: پووڵێکە دەدرێ بە کەسێکی، کە نوشتوو دەنووسێ، وەڵیفەت.

**سەرقۆت** (باک.): سەر رووت. ـــ ی(باک.): سەر رووتی، سەر قۆتێن.

**سەرقۆتین** (باک.): سەر ڕووت.

**سەرقۆق** (باک.): کەچەڵ.

**سەرقۆڵ**: سەرۆکی پاسەوان و نۆرەگران. پارچەپەڕۆیەکە لەسەر قۆڵ دەکرێتەوە، (باک.) تەبۆلیێت، سەردەست، سەرەقۆڵ.

**سەرقووڵە** (مرک.): جۆرە ترێیەکی سوورە وەک (مام برایمە) وایە سەری دەنکەکانی کەمێک قووڵە، چاوڕەشە.

**سەرک** (باک.): لەقەننە و سەبیلەیدا ئەو شوێنەیە، کە تووتنی تێدەکرێ. (باک.) مەبەس، ئامانج. (خۆ.) سەر.

**سەرکار**: نێوی پیاوانە. سەرکردەی کرێکاران، ئەو کەسەیە، کە لەلایەن ئاغاوە دەست نیشان کراوە، کە بەسەر کاروباری ڕەنجبەر و کرێکاران ڕابگات و ئاگاداری سامانی بێ. پێشکار، سەرەتای کار. ـــ انە: چتێکە، کە بەسەرکاری ئاغابدرێ لە لایەن ژێردەستانەوە. ـــ ڕۆیین: پەسا، بەشوێنی کاری ڕۆژانەچوون. ـــ ی: پیشە و کردەوەی سەرکار، گەورەیی، سەرپەرشتی یەکێک بۆ چەند کەسێک لە فەرمانێکیدا.

**سەرکاسە**: ژنی سەرکاسە.

**سەرکان** (باک.): سەرچاوە، بنەچەکە، ڕەگ و ڕیشە.

**سەرکاوان** (ئەردە.): کۆساران، سەردەسێر، کرویستان. ئۆقسەری چیایان.

**سەرکەتن** (باد.، هەو.): سەرکەوتن.

**سەرکەچ** (ئەردە.): ملکەچ، سەرشۆڕ.

**سەرکەر** (ئەردە.): دەمبەس.

**سەرکەردە**: سەرکردە.

**سەرکەردوو** (هەو.): سەری دێراوان.

**سەرکەش**: سەرکێش.

**سەرکەشکۆرە** (خۆ.): بنەگۆزەڵە، گیایەکە.

**سەرکەشی**: سەرکێشی.

**سەرکەف**: خوریەکی سپیە، کە لە سەرەوە دەگیرێ. کەفێکی خەستە لە کوڵانی سابوونی بەزیدا پەیدا دەبێ و دەگیرێ لە قابێکیدا دەمەیەنرێ دەبێ بەسابوون.

**سەرکەفەڵ** (هەورا.): پاشەزین، ئەرمەزین.

**سەرکەفتن** (ئەردە.): سەرکەوتن، چیرەبوون، پیرۆزی. چوونەسەر، سەرکەوتن.

**سەرکەل**: لای هەرە سەرەوەی گرد و شاخان، سەرکەلەبەری شاخ، تەپڵەسەری شاخ.

**سەرکەڵ**: بەرچیغ.

**سەرکەلە** (باک.): سەرشەمە. (دەر.) مژانکە.

**سەرکەللە**: ئەو بەشەیە، کە لە لغاو و هەوسار دەکرێتە سەری وولاخانەوە، کە بریتیە لە تەنراوێکی پان، سەرکەللەڕەشۆ. پارچە دەوارێکە خرابێتە سەر تەختە دەوارێکی کورت لەسەرباری درێژی.

**سەرکەنە** (زا.): چەند هەودا بەنێکی ئەستوورن لە چەند دارێکی دەبەسترێن کولۆشی پێ دەگوێزنەوە بۆ سەرخەرمان.

**سەرکەوا**: پۆشاکێکە لە سەر کەواوە لەبەرکرێ.

**سەرکەوت**: وەسەرکەوتوو. نێوی کوڕانە.

**سەرکەوتن**: بەر بەرزۆر چوون، (هەو.) سەرکەتن، چوونەسەر، وەسەرکەوتن. پیرۆزی، بەسەرکارێکیدا زاڵبوون.

**سەرکەوتوو**: وەسەرکەوتوو، بەمرازگەییشتوو، پیرۆزی دەسکەوتوو، بەسەرکارێکیدا زاڵبوو. وەسەرکەوتوو، کەسێکی لە نزمییەوە چووبێتە بەرزییەک، سەرکەفتگ، خشک، چیر، چیرە.

**سەرکردە**: سەرۆکی پێشمەرگان، هۆمان، فەرماندەی لەشکر، پێشەوا. ـ یی: سەرۆکێتی پێشمەرگان، هۆمانی.

**سەرکردن**: سەر و وەچی تووتن کردن. نرخ بڕین. سەربڕین. لاسەنگ بوونی تەرازوو بە چەشنێکی وا، کە لایەکی سووکتر بێ. بژاردن، بەسەرکردنەوە. لێنەدانی گوللە لە نیشانە، نیشانە نەنەنگاوتن، گوللە بەسەر نیشانەدا تێپەڕین.

**سەرکردنەسەر**: سەرنانەسەر.

**سەرکردنەوە**: بیرکردنەوە، ڕامان، ئازاد لە هەموو چتێکی سەردەکاتەوە.

**سەرکردن بە گۆما**: مەبەس لە لەناوبردنی چتێکییە.

**سەرکردنی تەرازوو**: کەچ هاتن، بەرواردن، باش تەرازبوون، لنگەیەکی بەلایەکیدا شۆڕ و گرانتربێ.

**سەرکردنی چاو**: باش نەدیتن.

**سەرکردنی گوللە**: نیشانە نەنەنگاوتن، لە نیشانە نەدان، لاسووڕ.

**سەرکردنی گوێزان**: مەبەس لە زۆر تیژییەتی.

**سەرکز**: بێدەنگ. بەپەرۆش، خەمگین، بێچارە. ـــ ی: بێچارەیی. بێدەنگی.

**سەرکل** (باک.، ئەردە.): تەرسەقول. (ئەردە.) سەرکڵۆم، گاڵەدان.

**سەرکڵاو**: هەرچتێکی لەسەر کڵاو دابنرێ ـــ ی پێدەڵێن. تەنەکەیەکە وەکوو کڵاو کونێکی درێژکۆڵەی تێدایە بەسەر پلیتەی لامپای چرای دادەکرێ.

**سەرکڵاوە**: سەرکەڵەوەی جووتی. قیتکایی سەرشاخان. سەرکڵاو. سەرتل، سەرتلی، سەری کڵاوان.

**سەرکلە** (ئەردە.): سەرکل.

**سەرکڵۆم**: کۆڵەدراو، دەرگایەکە داخرابێ و سەرکڵۆمەکەی ڕەتکرابێ.

**سەرکۆ** (ئەردە.): سەرزەنشت.

**سەرکۆبنە**: سەرکۆنە، سەرزەنش.

**سەرکۆت**: سەر ڕووت. ـــ ی دەخڵی: درشتەکانی سەر دەخڵ ودان وساواری دابێژراوە دووای هاڕینی، سەرکۆتەڵ. بێ سەرپۆش، بۆ نوستوو و قاپ و قاچاخ بەکاردەبرێ.

**سەرکۆتەڵ**: خڵت و خەوش و درشتەکانی دەخڵ و دانە، کە دووای لە دابێژرانی لە نێو بێژنگێدا دەمێنێتەوە، سەرکۆت، سەرکۆزەر.

**سەرکۆزەر**: سەرکۆتەڵ، پووش و پەڵاشێکە دەکەوێتە سەردانەوێڵە لە کاتی گێژ و تەتەڵەکردندا.

**سەرکۆم**: سەرکووڕ، سەر شۆڕ.

**سەرکۆمار**: سەرەک کۆمار، سەرۆکی چەند خێڵێکی کۆچەری. ـــ ی: سەرەک کۆماری.

**سەرکۆنە:** شەرمەزار، سەرشۆڕ، چاوشۆڕ، واویژ، منەت لەسەرکردن. ـــ کردن: بەچاودادانەوە، کۆڕانەوە، واویژکردن، سەرزەنشتکردن. ـــ کردن: بەسەر ڕژییشتن.

**سەرکورتان:** پارچە جەواڵ یا بەڕەیەکە بەسەر کورتانیدا دەدرێت، سەرجل.

**سەرکۆڵ** (باد.): سەر ڕووت.

**سەرکۆڵ:** (ئەردە.) تەپڵەکی کوڵەکەیە، سەرستوون. (کە.) جوورە پیوانێکە، کە کوڵ یا تەنەکە کە نەشلەقێنرێ. (باد.) سەر ڕووت، بێ کڵاو. سەرستوون، سەر کوڵەکە، سەر ئەستوندە. کوڵ، بەپێچەوانەی تیژ، تیغی نەبڕ و کول، سەرکول.

**سەرکوڵ:** بەرکوڵ.

**سەرکولۆم:** سەرکڵۆم، سەرکل.

**سەرکووبی** (ئەردە.): سەرزەنشت.

**سەرکووپان** (ئەردە.): سەرکورتان، سەرپاڵان.

**سەرکووم** (باک.): خشڵ یا پەڕێکی باڵندانە بەسەر کڵاوانەوە دەکرێ.

**سەرکوێر:** نازیرەک، گێل، سەغی، سەرلێشێواو یا سەر لێ تێکچوو، سەرکۆر، کوێردڵ، کەسێکی زۆر سەری بخرێتەسەر و یا لێبیدرێ و یان زۆر بخوێنێ ـــ دەبێ: سەری لێ دەشێوێ. ـــ بوون: سەر لێشێوان. ـــ کردن: سەرلێشێواندن. ـــ ی: سەرلێشێوان، نازیرەکی، کەودەنی، گێلی.

**سەرکێر** (باک.): نوختەی هەرەدوایی.

**سەرکێش:** پێشڕەو. تۆسن (بۆ وولاخان)، سەرچڵ، وولاخێکە، کە غاردا بۆت ڕانەوەستێ. سەربزێو، دەست بزێو، (شکا.) ختمی، تۆڕ، سەرپێچ، پسێن، بارنەبەر، بارنەوەر، پەت پسێن، پەتبڕ، ئازادی خوواز، سەرکەش، سەرڕەق، سەرچڵ، پرکێش، یاخی، خۆدەرخەر. وولاخێکە لە کاتی غارکردنیدا لە غار ڕانەوەستێتەوە، تۆزن، بەدسەر، چەمووش.

**سەرکێشان:** سەرە تاتکێ کردن. سەردان، دیدەنی کردن. ملکێشان، سەردەرهێنان. پێکشانی چتێک بۆ چتێک: ئەم کارە سەر دەکێشێتە سەر فیسارشت.

**سەرکێشانەوە:** بڕێتییەلە گورج کردنەوەو ڕاکێشانی خرێنەی فەردە توورتنی ڕەشۆکی لە کاتێکیدا سەرەک لەگەڵ بنەکەیدا بۆشایی تێکەوتبێ و بجووڵێت.

**سەرکێش بوون:** سەربزێوبوون، سەرپێچی.

**سەرکێشک** (ئەردە.): سەرنۆگە، سەرۆکی پاسەوانان.

**سەرکێشی:** سەر ڕەقی، بەدسەری، سەربزێوی، سەرپێچی، پۆپساندن، سەربزاوتن، یاخی بوون، لێهەڵگەڕانەوە، ئازادی خووازی، بەمزاج، لامۆفەک، پرکێشی، هلگافتن، ختمین، نەوەستانەوەی وولاخە لە غاردا. سەرلێدان، بەسەرکردنەوەی دۆست و خزم و ئاشناو نەخۆشان. ـــ کردن: سەربزێوی کردن، سەرپێچی.

**سەرکێف** (ئەردە.): سەرکەل، تەپۆڵکی کێوی.

**سەرگ** (ئەردە.): لای سەروو، سەرگین، بانگ، لای ژووروو.

**سەرگاویک:** (هەورا.) گیایەکی سەلکدارە وەک پیفۆک وایە، بەلام گەڵای ئەم کورتترە و دەخورێ.

**سەرگاویلک** (هەورا.): گیایەکی سەلکدارە وەکوو پیشۆک، بەلام گەڵای کورتترە و دەخورێ.

**سەرگاییینجە:** سەرمژانکە.

**سەرگە:** دژ، واتای بنگەیە، لای هەرە سەرەوەی باغی، زەوی، لەشکری یا هی مێگەلە ئاژاڵان و ئیتر.

**سەرگەبر** (فە.، زەن.، لور.، کە.): سیسارگ، سیسارگە کەچەڵە.

**سەرگەرد:** دەردەو گەڕێن، قوروانی، دەیوەگەڕێن، (ژا.، هەورا.) قووروان، قوربانی، گاوگەردوون، باڵاگەردان، خۆی کردە ـــ: خۆی کردە قوربانی.

**سەرگەردان:** ئەراگیل، حەبداڵ، مات و واق و وورماو، بێ جێ وڕێ، سەرلێشێواو، سەراسیمە، ئاوارە، دەربەدەر. ـــ بوون: سەرلێ شێوان. دەستەوەستان. ـــ بوون: سەرلێشێوان. ـــ کردن: سەرلێشێواندن. ـــ ی: تەنگانە، سەرلێشێوان.

**سەرگەردەنە:** سەرملە، ملە، گەردەنە.

**سەرگەرم:** خەریک، لەگژ، پرکار. پڕ شەوق و هەوەس، بەجەخت. قەڵس، تووڕە، تۆزن، ڕابەڵ. سەرخۆش، مەست. ئازا، بەجەرگ. ـــ ی: تەنگەتیلە، ڕاگەشی. خەریکی، لەگژی، کاروبار. پڕشەوقی، هەوەسداری. قەڵسی، تووڕەیی. مەستی، سەرخۆشی. ئازایی، بەجەرگی.

**سەرگەزی:** بنەگزەڵە.

**سەرگەفار** (زا.): سەرگەورە.

**سەرگەفاز** (باک.): سەرلەشکر.

**سەرگەورە:** سەرۆک.

**سەرگران:** مەبەس لەمرۆی سەرخۆشە. جیلوەگەر، عیشوەگەر، ناسک، جووان. ـــ ی: عیشوەگەری، ناسکی، جیلوەگەری.

**سەرگرتن:** ڕێک کەوتن، پێکهاتن. سەری وولاخ و هێسترگرتن. دارە ڕاو گڵەبانکردنی سەربان. ـــ وە: دزینەوەی چتی دزراو گووم بوو، گرتنەسەر.

**سەرگندان** (باک.): بێ خەم، بێ قەید، بێ پەرۆش، سەرگەردان. ـــ ی: سەرگەردانی، بێ پەرۆشی.

**سەرگۆ** (باک.، سوور.): سەرە نووێلک، کۆمای پیسایی، سەرگووێلک.

**سەرگۆت:** بەسەرهات.

**سەرگۆر:** قوربانی. ـــ ی خۆت و منداڵەکانت: واتە بیکە بەقوربانی خوت و منداڵەکانت. بیکە بە گاو گەردوونی خۆت و منداڵەکانت.

**سەرگۆش** (باک.): سەرکەللەی وولاخی. (باک.) ـــ ە: سەرپۆش.

**سەرگۆم:** گێسکی گەمژ.

**سەرگوڕشتە** (بابا.): بەسەرهات، بەسەربردە، سەراووردە.

**سەرگوروشتە:** بەسەرهات، سەرگوزەشتە.

**سەرگوزەشت:** بەسەرهات. ـــ ە: بەسەرهات.

**سەرگوڵ:** یەکەمین چایە لە چادانی تازە دەمکراودا، کە هێشتا ئاوی تێنەکرابێتەوە. نێوی ئافرەتانە. (کە.) بەرکوڵی چێشتی، هەڵبژاردە،

سەرپشک، نایاب، دانسته. (موک.) بژارده، سەرتۆپ، نوێبەرەی چتی تازە پێگەیشتوو.

**سەرگوم:** (باک.) ئاوارە، دەربەدەر، سرگوم، سوورگوم. ـــ کردن: لەناوبردن، تەفروتووناکردن، ئاوارەکردن، تەفروتووناکردن.

**سەرگوو** (باک.): سەرپۆش، (باک.) سەرکووش.

**سەرگووارە:** مرازێکە لە ناو کەرەستەی جووتیدا.

**سەرگوردان** (کە.): زبڵدان، پەیینگا.

**سەرگووش** (باک.): سەرپۆش.

**سەرگوە** (باک.): بوخچە، بەستەیەک جل و بەرگ.

**سەرگوێلک:** سەرانگوێلک، گۆریناخ، زبڵگە، زبڵدان، سەرەلووێنک، گوفەک، گوفەک، (خۆ.) بنگ، پەلک، خوەلیدانک، (دەر.) گێووک، سەرینگولان، (کۆ.) گیفۆک، (باک.) ئاریدانک، (بابا.) سەرەنووێلک.

**سەرگێجە** (ئەردە.): گێژی، سەرەخولێ، سەرە سوورێ.

**سەرگێر** (کە.): مافخۆر، قەرزکوێر، قەرزنەدەرەوە. (کە.) ـــ ی: مافخۆری، قەرزکوێری.

**سەرگێژ:** گێژ. ـــ اهی (باک.): گێژی، سەرگێژی. ـــ ی: سەرگێژاهی.

**سەرگین:** (زەن.) سەهەن، (ئەردە.) سەرگ، (دەر.) لاس، تەپاڵە، دەوەکێویلە، دەوەکێوی. شیاکە.

**سەرلانک:** بانچەوک.

**سەرلە:** ووتەیەکە یەکەمین دەمی کات پێشان دەدا وەکوو دەڵێن: ـــ ئێواری بنوو، ـــ بەیانی هەستە.

**سەرلەبەرد دان:** پەشیمان بوونەوە.

**سەرلەبەرد دەر:** پەشیمان، پاشگەز.

**سەرلەبەیانی:** سۆزی زوو.

**سەرلەدووینان:** ڕاونان، ڕەپێ نان، وەدوو کەوتن، ڕەدوو کەرتن.

**سەرلەڕێدابوون:** مەبەس لە ئامادەییە لە هەموو بارێکیدا بۆ ئەنجامدانی هەموو کاروبارێکی.

**سەرلەشکر:** فەرماندەر، سەرهەنگ، سەرداری لەشکر.

**سەرلەقاندن:** سەرهەژاندن، قایبیل نەبوون، ڕازی نەبوون.

**سەرلەقاین:** سەرلەقاندن.

**سەرلەنووێ:** (هەو.) لەنووژەن، نووژەن، دەریارە، هەمیسان.

**سەرلق:** لکی سەرەوەی داران، جوورە هەنارێکە، کە تێکولی لای قنچکەکەی زۆر ئەستوورێ و دەنکی کەمبێ.

**سەرلێ بادان:** مەبەس لە ناقابلییە لەکار و یا لە ووتارێکیدا.

**سەرلێ تێکچوون:** سەرلێشێوان.

**سەرلێ تێکدان:** سەرلێ شێواندن.

**سەرلێ خوران:** سەرخوران.

**سەرلێدان:** سەرکێشی، سەردان، چوونە دیدەنی چتێکی یا کەسێکی.

**سەرلێدەر:** سەردەر. ـــ چوون: زانین، شارەزایی، لێ تێگەیشتن، سەرلێدەرکردن. ـــ کردن: سەرلێدەرچوون، شارەزایی.

**سەرلێ سەندن:** وەڕەزکردنی یەکێک بە زۆر سەر خستنە سەری و یا زۆر چوونە لای.

**سەرلێشێوان:** بەسەرچوون، گێژبوون، لێ تێکچوون، ژرێ شاشبوون، هەڵبوواردن، تێکچوونی بیرو ڕاوێژ لە بارەی کەسێکی یا کارێکییەوە. ـــ دن: ژرێ شاشکردن، تێکدانی بیرو ڕاوێژ لە یەکێک.

**سەرلێشێواو:** سەرلێ تێکچوو.

**سەرلێشێویاگ:** سەرلێشێواو، سەرگەردان، پەرێشان.

**سەرلێشێویان:** سەرلێشێوان، پەرێشانی.

**سەرلێف** (باک.): لغاوە.

**سەرلێکردن:** سڵەمینەوە لە کردنی کارێک سا لە هەر ڕوویەکەوەبێ. ـــ وە: سەرلێکردن، سڵەمینەوە، لێڕامان.

**سەرلێگر** (بار.، گەر.): بزن یا مانگایەکە نەبان بێت.

**سەرم** (باک.): سەرما، سەردی، سەرد، ساردی.

**سەرما:** سەردی، ساردی هەوا، (موک.) سۆڵە، سەرماوسۆڵە، ساردی و سۆڵە، بەرواژی گەرمایەیە.

**سەرمابردە:** سەرمابردوو. ـــ ڵە: کەسێکە سەرما زوو کاری لێبکات.

**سەرمابردگ** (ئەردە.): سەرمابردوو.

**سەرمابردن:** کارتێکردنی سەرما لە چتێک.

**سەرمابردوو:** سەرمابردەڵە، چتێکە سەرما کاری تێکردبێ و ژاکاندبێتی. سڕ، بێ هەست، سەرما کارلێکردوو. میوەیێکە سەرما لەکەڵکی خستبێ.

**سەرمابوون:** هەست بە سەرمایەکردن، کارکردنی سەرما لە مەردوم.

**سەرماخواردگی:** باپەر، چاپانی.

**سەرماخواردن:** باپەربوون.

**سەرمازەڵە:** پیسپیسک، خەمەگرو، قومقومۆکە، سەرمازوولکە.

**سەرماڵ** (باد.): سەرمایە، دەستمایە.

**سەرمانگ:** سەرەتای مانگ.

**سەرمانۆ** (باک.): لەرزین.

**سەرماوەز:** مانگی هەرە دوایی کەشی پاییزێیە، چریا دووێ، چریا پاشی، کەوبەردار.

**سەرماوسڕ:** ساردی و سڕ. ـــ ی: سەرماوسۆڵە، ساردی و سڕی.

**سەرماوسۆڵە:** کاتی سەرماوسڕی.

**سەرمایە:** دەسمایە، دەستمایە، دەزمایە، (باک.) بەلگە، تمتێل، (باد.) سەرماڵ، مایە.

**سەرمایەدار:** خاوەند ماڵ و سامان، دەستمایەدار. ـــ ی: دەستمایەداری، خاوەندێتی ماڵ وسامان.

**سەرمای پیرێژنێ:** هەفتەی هەرە دوایی زستانییە، کە سێ ڕۆژی دەکەوێتە دوایی زستانێ و چووار ڕۆژیشی دەکەوێتە سەرەتای بەهارێوە، (باک.) گیسکێت پیرێ.

**سەرمای سەخت:** (باک.) سەقەم، کەلواز، زەمەن، جەورە.

**سەرمایی** (باک.): لەرزین.

**سەرمەرز** (دەر.): هۆگان.

**سەرمەس** (هەورا.): سەرمەست.

**سەرمەست**: سەرمەس، سەرخۆش، مەس، مەست. ـــ ی: سەرخۆشی.

**سەرمەشق**: تەنها دێڕێک مامۆستا لە سەرەوەی قاقەزێکی دەنووسێ تا بۆ خۆشنووسی قوتابیان لەبەری بنووسنەوە. نموونە. پێشەوا، ڕابەر، ئەو کەسەیە، کە هەموو کەسێک پەیڕەوی بکات. ـــ انە: سەرمەشکانە.

**سەرمەشکانە** (هەورا.): سەرمەشقانە، سەرمشقانە، دراو یا پارچە خشڵ یا لیرەیەکە، کە لە هەوەڵ شەوێدا زاوا لە پێش هەموو چتێکیدا دەیدا بە (بووک).

**سەرمەفرەشی** (ئەردە.): کارەکەر.

**سەرمەقولات**: سەر لە سەر زەویدانان و بە پشتدا خۆ هەڵگێڕانەوە، (هەو.) تەقرەقووچ، تەقلە، هەڵگەڕیانەوە، کەلەمیحلەق.

**سەرمەقولاتدان**: تەقڵەدان، تەقڵە لێدان.

**سەرمەڵا** (ئەردە.): سەرەوەستای یاری، سەردەستە.

**سەرمەند**: سەرسام، سەرسووڕماو. (هەورا.) ـــ ی: سەرسووڕمان، سەرسامی.

**سەرمژانە** (هەو.): گاگیرە، بەستەدارێکە نیر و مژانەی لێک قایم دەکات، سەرمژانکە، (دەر.) سەرکەلە، (کە.) گاینجە، سەرگایینجە.

**سەرمژانکە**: سەرمژانە.

**سەرمصاخ**: ناوی گوندێکی کوردانە لە نزیک چیای قەرەچووخێ لە سەر ڕێی (دێرکێ) یە.

**سەرمشقانە**: سەرمەشکانە.

**سەرمک** (ئەردە.): سەرجەم.

**سەرملە**: تۆقەسەری گرد و شاخان، سەرگەردەنە، ملە.

**سەرم لەڕێدایە**: مەبەس: بەسەروماڵ ئامادەم بۆ ئەنجامدانی هەموو کاروبارێک.

**سەرملەگیر**: جەردە، ڕێگر.

**سەرمۆر**: چتی سەربەمۆر، دەرمۆر، مۆرکراو، مۆرنەشکاو، نیشانە نەشکاو، دەست لێنەدراو.

**سەرمێز**: چتێکی خاوێن و جوانە بەسەر مێزیدا دەدرێ.

**سەرمێکوتە**: داعبایەکی سەرخڕی کلک باریکی گچکەیە لەناو زەلکاوێدا دەژی، کە گەورە بوو دەبێتە مێکوتە.

**سەرمێووژ** (هەو.): سەرمێووژە.

**سەرمێووژە**: سەرمێووژ، مارێکە سەری وەکوو مێووژی وایە درێژۆکە و ڕەش و باریک و کوژندەیە بۆریشی هەیە.

**سەرمیان** (زا.): سەرمایە. سەرۆک، سەردار، گەورە، ڕابەر. ـــ ی: سەرۆکی، سەرۆکایەتی، داڵنگ.

**سەرمیچ**: حسیر یا تەختە بەندی سەر دارەڕایە.

**سەرناز**: سەرەنداز.

**سەرنامە**: ناوونیشان، (ئادرێس).

**سەرنان**: سەردانان.

**سەرنانەسەر**: مەبەس لە قسە زۆر لەگەڵ کردنی یەکێکییە بۆ تووڕەکردنی.

**سەرنانەوە**: نوستن، درێژبوون. داپۆشین. مەبەس لەدەربەدەرێتی و دوورکەوتنەوەی یەکێکیە لە شوێنی خۆی.

**سەرناو**: سەرنێو، بەرناف، نازناو.

**سەرناوکانە**: دراو یا دیارییەکە، کە لە هەفتەی زەییستانێدا لەلایەن دۆست و ناسیارانەوە دەبرێ و دەدرێ بە مامان.

**سەرنەخووین** (باک.): سەرنخوون.

**سەرنەزەدە**: بێدەنگ، بێ ئاگا، بێ خەوەر.

**سەرنەشێف** (باک.): سەرنشێو، سەربەرەوخووار، سەرەوژێر، (جا.) دانگە. (باک.) ـــ ی: سەرنشێوی.

**سەرنەوی**: سەرشۆڕ، سەرنزم. ـــ بوون: سەرنزم بوون. ـــ کردن: سەردانەواندن.

**سەرنج**: بەراوەرد، باخاف، کنە، بەووردی تەماشاکردن، تەماشا. ـــ ە: سەرنج، ووردبوونەوە. ـــ دان: تێڕامان، کنەکردن، لێ ووردبوونەوە. ـــ دەر: ووردبین.

**سەرنخوون**: قلّپ، سەرەونخوون، سەرنەخووین، دەمەونخوون. ـــ بوون: قلّپ بوونەوە. ـــ کردن: سەرنشێو، سەرەوژێر. ـــ کردنەوە: سەرەوژێرکردنەوە.

**سەرنزم**: سەرشۆڕ، شێپل. ـــ ی: سەرشۆڕی.

**سەرنشێو**: بەرەوخووار. سەرشۆڕ، سەرنزم. ـــ ی: سەرشۆڕی. بەرەوخووارەوەیی.

**سەرنقەک**: ناوچە، نێوان.

**سەرنقشت**: سەرنقیشت.

**سەرنقیشت**: چارەنووس، سەرنوویشت.

**سەرنقاب** (زا.): سەرنامە.

**سەرنگ** (باک.): جوورە ماسییەکە.

**سەرنگا** (هەورا.): لای سەرێ، سەرینگا.

**سەرنگووم**: سەرنگوون.

**سەرنگوون**: سەرەوژێر، قلّپ.

**سەرنگیا** (دەل.): سەنیر، سەوین، بالیف.

**سەرنۆکە** (ئەردە.): سەرۆکی یاساوڵ و نۆبەداران.

**سەرنوخوون**: سەرنخوون.

**سەرنووس**: سەرنەژمێر، سەردەفتەر، سەرژمێر.

**سەرنووسەر**: سەرنووس. ـــ ی: سەرنووسین.

**سەرنووسین**: سەرنووسی.

**سەرنوویشت**: چارەنووس. ـــ ە: سەرنامە، پێشوێن، ناوونیشان.

**سەرنێ**: دیوارێکە (نێ) ی ئاشی تێدا هەڵدەسپێردرێ.

**سەرنێو**: سەرناو، سەرناف، نازناو.

**سەرنێوکانە**: چتێکە دووای منداڵ بوون و ناوک بڕینی دەدرێ بە مامان.

**سەرنیا** (کە. ، هەورا.): سەنیر، سەرین.

**سەرنیان** (ئەردە.): سەرنانەوە، مل نیان.

**سەرنیانەوە** (کە.): سەرنانەوە، نوستن. سەرێ خۆ هەڵگرتن، ئاوارە و دەربەدەربوون.

**سەروا:** پاشبەند. (هەورا.) سەرما.

**سەرواز:** لەشکر، ئۆردوو. (ئەردە.) سەرباز، پێشمەرگە. سەرنەبەستراو، سەرنەبەسیاگ، سەرنەوەسیاگ، سەرئاوەڵە. لێوڕێژ، سەرشار، لیپان.

**سەروازخانە** (ئەردە.): سەربازخانە، سەرای پێشمەرگان.

**سەرواڵە:** نووسەکە، پەزشکە.

**سەروان** (باک.): ووشترەوان.

**سەرەوواردەی** (هەورا.): بە سەرماکەوتن.

**سەرەوەخت** (باک.): ئاگادار. ــ کردن: ئاگادارکردن.

**سەرەوەدەر:** بەنێوبانگ، بەناوبانگ، ناودار. ــ ی: ناوداری.

**سەرەوەدروو:** جوورە دروومانێکە، سەرەودروو.

**سەرەوەر:** سەردار، سەرۆک، خاوەندشکۆ، گەورەی بەرێز و خۆشەویست.

**سەر وەرگێڕان:** ڕوو وەرگێڕان، سەرزڤراندن، سەربادان، ڕووزڤڕین، سەرگوهازتن، سەرزڤڕین.

**سەرەوەرێتی:** سەرۆکێتی.

**سەرەوەری:** شکۆ، شان، گەورەیی.

**سەرەوەسەرێ:** سەربەسەرێ، بەقەدیەکتری، پێک گۆڕینەوە، ئاڵ و گۆڕ.

**سەرەوەستا:** سەرۆکی وەستایان.

**سەرەوەستان** (کە.): سەربەستن.

**سەرەوەش** (هەورا.): سەرخۆش. (هەورا.) ــ ی: سەرەخۆشی، پرسە، پەرسە.

**سەرەوەنیان** (ئەردە.): بەسەرەوەنان، هەڵ لووشین، خوواردنەوە.

**سەرەویا** (هەورا.): سەرەوپێ.

**سەرۆک:** سەردار، سەرکردە، پێشەوای گەلێک مەزن، سالار، ئاغا، براگەورە، یەکمان، سان، کلیبیت، (باک.) باخوە، هرار.

**سەرۆکایەتی:** گەورەیی، ڕابەری هۆزێک.

**سەرۆکێتی:** سەرەکێتی.

**سەرۆکی:** سەرەکی.

**سەرۆکی شاری:** سەرۆکی شارەوانی، گەورەی شار.

**سەرۆکی شارەوانی:** گەورەی شاروشارەوانی.

**سەروو:** لای ژووروو، لای ژۆر، سەلوو، سەلوا، (باک.) سەلوی. نێوی ئافرەتانە. دارێکی بالابەرز و ڕاستە هەمیشە سەوزە و گەڵاکانی وورد وخڕن. سەرەوە. بەرەڵاکردنی شیرە لە مەمک یا لە گوان، دێنن گووێلکی تێبەردەدەن تا شیری دادەدا ئەوسا لێی دەکەنەوە، سەرەڕۆ.

**سەرووبانی** (هەورا.): سەربان.

**سەروبەر:** ڕێک و پوخت، ڕێک و پێک، ئامادە. بە ــ: پوخت، ڕێک و پێک. بێ ــ: ناڕێک، ناپوخت، شلێخە، شلووق، ناکۆک. ــ ی خۆکردن: خۆئامادەکردن. بەقەد یەکتری، بەبێ کەم و کووڕی؛ چێشتەکە ــ دەرچوو. ــ کردن: ڕێک وپێک کردن، ئامادەکردن.

**سەروبەند:** ئامادە، ڕێک و پێک. ــ بەستن: ڕێکخستن، ئامادەکردن. ــ گرتن: سەروبەند بەستن.

**سەروبن:** جوورە نەخۆشێکە لە سەروبنی مانگاندا دووچاری منداڵی ساوادەبێ.

**سەرویا:** سەرەوپێ.

**سەرویاچک** (دەر.): سەرەوپێ.

**سەرویەچک** (ئەردە.): سەروپێچ.

**سەروپۆتەلاک:** سەروپێچ.

**سەروپۆتراک:** پۆت، پوتەراک، پۆتراک، (ڕەوا.) سەروپۆڕ، (هەورا.) سەروپۆتک، تیلاک، پۆرتک، ــ ی ژنان: کۆفیک.

**سەروپۆتک:** سەروپۆتراک.

**سەروپۆتلاک:** سەروپێچ، کۆفی.

**سەروپۆرت:** کەم، کورتیەکەی.

**سەروپۆرت** (ئەردە.): سەروپێچ.

**سەروپۆرتک** (ئەردە.): سەروپێچ و کڵاو و دەسماڵی ئافرەتان.

**سەروپۆز** (ڕەوا.): سەروپۆتراک.

**سەروپێ** (موک.): (دەر.) سەروپاچک، (هەورا.) کەلەپاچە، کەللەپاچە، کەلەپەرچە، (ڕۆژ.) پاچە، کەللەوپێ، کەلەوپاچە.

**سەروپێچ:** کۆفی، کۆڤیک، چتێکە لە سەر ببەسترێ. چۆنێتی بەستنی سەروپێچ: ئازاد ــ یکی جووانی هەیە.

**سەروچاو:** ڕوو، ڕوخسار، سەروڕوو، (ئەردە.) دەک و دیم.

**سەروخان** (باک.): نێوی نێرینانە.

**سەرودەر:** سەروودەروو.

**سەرودەروو:** لەکانگای چتێکی وورد گەییشتن: ئەوکارە ئەوەندە گرانە ــ ی لێ ناکەم: سەرم لێی دەرناچێ، (ئەردە.) سەردروو.

**سەروژێر:** پێڵاوی بنکۆنی سەرتازە. ئاسنێکی نێر و مێی چکۆڵەیە وەکوو قرتێنە لە هێندێ چەرم هەڵدەکێشرێ. تاتی، سەر و بۆر و ژێر. خانووی دوو نهۆم. ــ بوون: سەرەوژێربوون، ڕووخان و ڕمانی شووێنێک. ــ کردن: سەرەوژێرکردن، ڕووخاندن و وێرانکردنی شووێنێک.

**سەروساخت:** ئاشنایەتی و ئاسیاوی لەگەڵ یەکێکی: ئازاد لەگەڵ بارامی ــ ی هەیە. ــ ی: سەروساخت.

**سەروسەکەت** (باک.): بار.

**سەروسەکوت:** قەڵافەت، سەروپۆتراک لە شووێنی سووکیدا.

**سەروسەمەنە:** سەروسەنەمە، پێوقەدەم.

**سەروسەنەمە:** سەروسەمەنە، پێ و قەدەم، منداڵەکەی زارایە ــ یەکی باشی نەبوو.

**سەروسیما:** قەڵافەت، شێوە و قەدوبالاو ڕوخساری یەکێکی وا، کە شەرمی لێ بکرێ.

**سەروشیێ** (هەورا.): سەرمشووشە.

**سەرووک** (باک.): پەردە.

**سەروکار:** بەندیواری، نێوان.

**سەروکانی:** سەرچاوە، کانگە. ناوی دێیەکیشە. ــ چاو (ڕەوا.، بار.) قولینچکی چاو بەلای کەپۆوە.

**سەروکووێلاک:** سەروسەکوت.

**سەرومڕ** (بابا.): تێروتەسەل، تەواو، بێ کەم و کووڕی، ڕەبەق.

**سەرومێقل:** سەروپۆتراک.

**سەرومیت:** ووتەیەکە لە گەمەی مووشێنێدا دەکوترێ لەکاتێکیدا، کە لە پاش یەکێکییەوە تیل بکەی، مەبەس لەوەیە، کە ئەگەر وەبەر مووش و هەڵماتی هاورێکەت بکەوێ هەر حەڵبێ.

**سەرووناز:** نێوی ئافرەتانە.

**سەرووناوکردن:** داکوتانی سنجووقێ لە ژوور سەر و خوارەوەی ئەمدیوە و دیوی سنجووقی هاورێیەکەت، کە تێکەوتووە.

**سەرووندەکرن** (باک.): سەرلێشێوان.

**سەروونگ:** سەرنگ.

**سەرووێچن** (هەورا.): سەرکۆزەر.

**سەرووێ** (هەورا.): لەسەرەخۆ.

**سەروو وێشیەی** (هەورا.): لەسەر خۆ چوون.

**سەروویی** (هەورا.): لەسەرەخۆیی.

**سەروێکردن:** هانا بۆ بردن، پەنا بۆ بردن. سەر وە سەنیری کردن.

**سەروین** (فە.): هێڵەگ.

**سەرهات** (ئەردە.): رووداو، بەسەرهات، هەنگامە. (ئەردە.) ـــ ن: بەسەرهاتن. هەڵهاتن، تەواوبوون، کۆتایی هاتن. زەڕهاتن.

**سەرهاتی** (باک.): بەسەرهات، رووداو.

**سەرهاتیزان:** (باک.) سەرهاتی بێژ، مێژووان.

**سەرهاوار:** شووێنێکە شینایی و لەوەڕی لێبێ.

**سەرهاووردن** (ئەردە.): بەسەرهاووردن، تەواوکردن، کۆتایی پێدان. (ئەردە.) ـــ وبردن: سەرکردنەوە، تێرامان، بیرکردنەوە.

**سەرهەردی** (باک.): جوورە هەڵپەڕینێکە.

**سەرهەزار:** سەرەوار.

**سەرهەشین** (باک.): باڵندەییکە.

**سەرهەڤ** (باک.): سەریەکتری، رێک و پێک. (باک.) ـــ ە: بەسەریەکەوە، پێکەوە.

**سەرهەڤ دانین** (باک.): رێک وپێک کردن.

**سەرهەڵبراندن** (ئەردە.): دابین کردن.

**سەرهەڵدان:** پەیدابوون، دەرکەوتن.

**سەرهەڵگرتن:** رۆیشتنێکە گەرانەوەی لەدوایە نەبێ، دوور رۆیشتن، شووێنی خۆ بەجێ هێشتن.

**سەرهەم بەننی** (ئەردە.): دەستی دەستی، تەفرە.

**سەرهەنگ:** سەرۆکی مێش هەنگوینان. سەرهەزار، سەرناوێکی سەرلەشکر و پێشمەرگانە.

**سەرهەنگفتن:** دەست خستنە سەرسەر بۆ گەورەیی و رێزگرتنی یەکێک.

**سەرهەویر:** سەرەویر.

**سەرهشک** (باک.): سەرڕەق، کەللەرەق. ووڵاخی سەرکێش. ـــ ی(باک.): سەرڕەقی، کەللەرەقی.

**سەرهلانین:** سەربڵندکردن، پێشگیری کردن.

**سەرهۆ** (هەورا.): سەرسەدە.

**سەرهوستە** (باد.): سەروەستا.

**سەرهێش** (ئەردە.): ئەو دارەیە لە کەرەستەی جووتیدا، کە گاسنی تێدەخرێ. ـــ ان: سەرئێشان. ـــ اندن: سەرئێشاندن. ـــ ە: سەرئێشە.

**سەریاڵ:** هاترمە. (کە.) گردانە، سەرەوەی زنجیرەی کێوان، سەرەوەی یاڵی ووڵاخان.

**سەریەک:** لەسەر یەکتری، بان یەک، تێکرا. کەڵەکە.

**سەریەکهاوێسان** (ئەردە.): لەسەر پێیەکی ڕاوەستان.

**سەرێ** (هەورا.): باکوور.

**سەرێزەفانۆ** (باک.): گۆرانی تایبەتی زەماوەندی ژنهێنانێیە.

**سەرێش** (بابا.): ناوی هەموو کەرەستەکانی جووتییە، کەرەستەی جووتی (نیر و ئامورر).

**سەرێشان:** سەرئێشان، سەرئێشە. ـــ اندن: سەرئێشاندن.

**سەرێشە:** سەرئێشە، ئێشی سەر، دەردەسەری، نەخۆشی سەر ئێشانێ، ژانەسەر، سەراسێ.

**سەرێلە** (باک.): گۆرانی پاییزێیە.

**سەرێنی:** کاتی بوون، بە سەرێنی من نەتەوەی کورد زۆریشی قوربانی داوە و داخەکەم هێشتا بە ئامانجی خۆی، کە ڕزگارییە نەگەییشتووە.

**سەری** (باک.): دیدەنی.

**سەری بەردی:** چیایەکە کەوتۆتە باکووری رەواندزی بەلای سیدەکانەوە.

**سەری خۆگەرزاندن:** گەران، سەیران کردن.

**سەری بخووا:** سوودی لێ نەبینێ و بۆی شووم بێ.

**سەری چیا:** تەپۆڵکەی چیا.

**سەری چیچکێ:** سەری گۆی مەمکێ.

**سەری ژێستاندن:** لێ ئەستاندن، بەزاندن.

**سەریدان:** دیدەنی کردن.

**سەری ژێ هنگفتن:** بۆ لای چوون.

**سەری سانگ** (باک.): مانگی پێنجەمینە، میوەگەنان، تیرمە.

**سەری کرن:** پڕکردن.

**سەرین:** سەنیر، بالیف، چتێکی نەرمە لە کاتی نوستنێدا سەری لە سەر دادەنرێت. سەرینگان، لای سەروو. (هەورا.) باکوور.

**سەرین:** زەڕین.

**سەرینگا** (باد.، جا.): سەنیر، سەرین، بالیف، (هەورا.) سەرنگا.

**سەرینگان:** لای سەرەوە، دژی پێ یینگان. (هەو.) بەردێکە لە ناو گۆڕیچەدا دەکەوێتە لای سەرییەوە.

**سەرینگە** (دەر.): سەنیر.

**سەرینی:** تەمەن، ژیان، بوون، کاتی لە دایک بوونێیە، بە ـــ خۆم من کوردم بە ئازادی نەدیوە.

**سەزا:** سزا.

**سەعات:** کاتژمێر، ماوەی ٦٠ خولەکە، مرازێکە کۆک دەکرێ و کاردەکات و کات نیشاندەدا. کات، دەم.

سەعات

**سەعدانی:** سادانی، جوورە ترێیەکی سپی دەنک شاشە.

**سەعلەب:** بنکی گیای سالمەیە و زۆر بەنرخە.

**سەغدە** (باک.): سەدەقە، خێر، بەرە سەغدا سەرێ تەبێ: با سەدەقەو خێری سەری تۆ بێ.

**سەفان** (باک.): زنجیرەی کێوان.

**سەفەر** (ع.): گەڕان، ڕۆیین، ڕۆیشتن، گەشت.

**سەفەربەر:** جەنگێکی گشتییە و هەرکەسێکی گیرا ڕاپێچ بکرێ و ڕەوانەی جەنگ بکرێ.

**سەفتە:** چینە چتێکی لەسەر یەکتری دانراوە. ـــ کردن: چت لەسەر یەکتری دانان.

**سەفک** (باک.): جوورە قاپێکە. هەیوان، بێلاّیی.

**سەفۆری:** سمۆرە.

**سەفیر** (باک.): دوودەی ڕەشی چرا.

**سەفیل:** نزم، هیچ و پووچ، ناکەس.

**سەفین:** زنجیرە کێوێکی بەرزە کەوتۆتە باشووری شەقلاوە. سەفان.

**سەفۆری** (باک.): سمۆرە.

**سەفی** (باک.): عەرەبانەی دووپێچکییە. (زا.) سەوی.

**سەق** (باک.): شابەڕوو.

**سەقا:** باڵندەیێکی ئاوییە، کە ئاو ووشک بێ کزدەبێ. (باک.) ئاودانی داس و تەشوێ و چتی ترە، تیژکردن.

**سەقاخانە:** شوێنێکە داس و تەشوی و کەرەستەی تری تێدا ئاوبدرێ و تیژبکرێ.

**سەقادان:** ڕێکخستن، تیژکردن.

**سەقاقوش:** باڵندەیێکی گەورە ودرێژی لەوێنەی قازییە، بەلاّن دندووکی پانترە کیسەیەکی بەژێر ملی و دندووکییەوەیە کیلۆیەک ئاوەدەگرێت لە لایەن پێ و پەڕو لەش و لاقدا وەکوو قازی وایە.

**سەقام:** ڕێکی. جێگیر، ڕێک و پێکی.

**سەقامات** (ڕۆژ.): سەردەم، کات، ڕۆژگار.

**سەقامدان:** ڕێکخستنی چت.

**سەقامگرتن:** جێگیربوون.

**سەقامگیر:** کەسێکە یا چتێکە لە شوێنێکی جێگیر بووبێ، جێگیر، ـــ بوون: جێگیربوون. ـــ ی: جێگیری.

**سەقاو:** دەردێکی لەمقار سەختترە تووشی وولاّخی یەکسم دەبێ.

**سەقاهەلگرتن:** تێراوبوونی زەوییە بە هۆی باران و پەلّەوە.

**سەقەت:** لەکارکەوتوو، بێ کەلّک. بۆ گیان لەبەرێکی بەکاردەبرێ، کە ئەندامێکی شکابێ و چاک نەبووبێتەوە. ـــ ی: کەم و کووڕی، بێ کەلّکی.

**سەقەلەوێنجە:** گیایەکە وە وێنجەی دەچێ کە لووی درێژ و باریکە.

**سەقەم** (باک.): ئیشکەبەند، ووشکەبەند، جێگایەکە بەفری لێ نەبێ و ساردبێ. سەرمای سەخت.

**سەقەدار:** نەخۆشێکی وولاّخانە.

**سەقەر:** دێ، ولەم، (باک.) ئلە، (دەر.) سەقەر. باڵندەیێکە وە بازی دەچێ و کەویش دەکرێ.

**سەقز:** نێوی شارێکییە لە کوێستانی کوردستانێدا.

**سەقی** (زا.): جوورە بەردێکی سەختی زەردباوە.

**سەکار:** سەلّەیەکی گەورەیە هەنجیری لەسەر دادەنرێ. (باک.) کورتان.

**سەکاف** (باد.): سەگاو.

**سەکالاّ** (ئەردە.): سکالاّ، ووتووێژ، گفتوگۆ.

**سەکانن** (ئەردە.): چەسپاندن، دوژیندان، جنێودان.

**سەکەت:** شێوەی ڕۆییشتن، ڕەووش. تۆپیو (بۆ مالاّت و سەگ و گورگ و ئیتر).

**سەکەت بوون** (باک.): تۆپین (بۆ مالاّت و سەگ و گورگ و ئیتر).

**سەکەت کردن** (باک.): تۆپاندن.

**سەکەرات** (باک.): کاتی هەرە دوایی.

**سەکەماتی:** مرۆی سەرسەری.

**سەکتین** (باک.): شکاندن، قەلّەشتن. (زا.) تۆپین.

**سەکرە** (زا.): جامی دزیە.

**سەکسار:** سەگسار، مەیمونی نێری قوونسوور.

**سەکمان** (باک.): سەگمان.

**سەکۆ:** (باک.) تل، تووم، دک، دکان، قەرشات، هۆلک، کوێ، کۆسپەی بلّند، مت، هەرە، بەرزاییێکە لە قوڕوبەرد یا لە گێچ و بەرد و خشت دروستدەکرێ بۆ لەسەردانیشتنی.

**سەکوت:** سەروپۆتراک بەلاّن لەگەلّ سەر نەبێ بەکارنابرێ: سەروسەکوت.

**سەکوم** (زا.): سەروسەکوت.

**سەکین** (ئەردە.): پێکەوە نووسانی سەگی نێر و مێیە.

**سەگ:** (دەر.) سەو، (باک.) کوچک، (دزە.) سپە، گەماڵ، (باک.) سە(صە)، سەی، سەە، (هەو.) کسۆک، (هەورا.) تووتە، سەناتوو، سپلّەوورت، سپلّۆت، سلپۆت، (شارە.) مردار. سپلّۆک، سپلّە، سپاک، سەگی مێ: دێڵ، دێلّەسەگ، (ئاوێ.) سپاکۆ. سەگی نێر: کۆڕ، کۆلّەسەگ، گەماڵ. سەگی پیر: گەپە.

سەگ

**سەگانە:** ئەوجوورە کردارانەیە لە سەگ بوەشێتەوە.

**سەگاو:** سەگلاّو، سەیێ ئاڤێ، سەماسی، سەیاف، داعبایەکی ئاوی درێژی چووار پێ وەگوێلکی ساوا دەچێ چنگی وەکوو چنگی سەگییە و پێستی بەنرخە. (ئەردە.) ـــ ی: سەگلاّو، سەگاو.

**سەگەبەڕەلاّ:** خوێڕی، تڕۆ، سەرسەری.

**سەگەجەنگی** (ئەردە.): شەڕەسەگ.

**سەگەسەگە:** مەبەس لە مێ بازییە.

**سەگەناز** (کە.): سەگەناس، دەردێکە تووشی سەگان دەبێ، کە لێی گرانترکرد لە تاوان دەقووڕێنێ و دەلووڕێنێ و پێشی دەتۆپێ.

**سەگەک** (ئەردە.): پاینەکێش.

**سەگەناس:** سەگەناز، دەردو ئازارێکی سەگانە.

**سەگوان:** کەسێکە تەنها سەگی بە خێو بکات. ـــ ی: سەگ ڕاگرتن، سەگ بە خێوکردن.

**سەگبا** (ڕەوا.): دەردێکی سەگانە قوونیان دەگیرێ و پیسایییان پێ ناکرێ.

**سەگبەب**: کوڕی سەگ، لەکاتی جنێو و ڕق هەستانێدا بەکاردەبرێ.

**سەگبان**: (باک.) سەگمان.

**سەگ بە حەسار**: سەگ بە حەووش.

**سەگ بە حەووش**: مەبەس ئەوەیە سەگ یا گیان لەبەرێکی تر بخرێتە ناو حەووش و لێی درێ و کوتەککاری بکرێ.

**سەگ بنێمی**: سەگ بنێسە، (کۆ. شا.) سەگەناسە.

**سەگ پسێنکە**: کەروێشکی یەکسالانەیە.

**سەگدەس**: سەگدەست.

**سەگدەست**: ماڵاتێکە سەمەکانی بڕێک خوواربێ وخۆش بنگێوێ. ـــ ی: سەگدەسی.

**سەگسار**: نێرەی مەیموونێیە، مەیموونی نێرە، قوونسوور، سەکسار، وەکوو سەگ، بۆ جنێو بەکاردەبرێ لە ڕاست نافرەتاندا.

**سەگسەگانێ** (هەو.): گەمەیەکی کوڕ و کچانە.

**سەگسەگە**: گەرۆک، گەرپدە.

**سەگشکاری**: توڵە، یوز، سەگی ڕاوێ.

**سەگڤان** (باد.): (باک) سەگمان. نیشانچی.

**سەگڤان** (باک.): ڕاوکەر، نێچیرەوان.

**سەگ کوژ**: سەکوژ.

**سەگلاو** (هەورا.): سەگاو، سەگی ئاوێ، داعبایەکی ئاوی و درێژە چوارپێیەکانی وەگوێلکی ساوا دەچی، چنگیشی لە هی سەگ دەچێ پێستی بەنرخە. (باک.) ـــ ی: نەژادی ئەسپانە، جووره ماییێن یا ئەسپێکی ڕەسەنە.

**سەگلوور**: لوورەلووری سەگ.

**سەگماسی**: سەگی دەریایی و مێرو.

**سەگمان** (باک.): مرۆی لێهاتوو. (باد.، باک.) سەگڤان، سەکمان، سەگمان ئەنگێو، نیشانە شکێن. (باک.) پێشمەرگەی پیادە. ـــ ئەنگێو: نیشانە ئەنگێو، نیشانەشکێن.

**سەگمەرگ**: مەبەس لە مەردومی گیانسەختە.

**سەگمەرگی**: بەدبەختی، کەنەفتی، مردن و گیاندان، ژیان بە تاڵی ڕابواردن، گوزەرانکردن بە سەختی و تاڵی.

**سەگوەڕ**: دەنگی وەڕینی سەگی زۆر. سەوەڕ. ـــ ی: وەڕین و حەپەحەپی سەگ.

**سەگوور** (باک.): سەوگوور، (باک.) سەگوور، داعبایەکە لە نێوانی سەگ و گورگیدا پەیدا دەبێ. (باک.) ڕووناکایی بەیانی، تاریک و ڕوونی بەیانی.

**سەگهار**: سەگی هار.

**سەگێتی**: زۆرزانی، ساختەچێتی، خراپە.

**سەگی ڕاوێ** (ئەردە.): سەگی شکاری، (ئەردە.) یوز.

**سەگی هار**: سەگی گەزندە، سەگهار.

**سەل** (باک.): تاتەبەردی لووس، تەلەبەرد.

**سەلا** (شکا.): سەرەوەی باڵ. (موک.) بەدبەختی، چارەڕەشی، لێقەوماوی، ئەی ـــ لەخۆم، وەی ـــ لەخۆی، ـــ لە چاوی خۆی. گۆرانی ئاییینییە، کەبار، بەربانگ.

**سەلابە** (ئەردە.): دەنگی هاوونگی، کە لە بلوور یاداری ڕەق و یا لە بەردی دوورستی دەکەن.

**سەلار**: پیاو و ژنی سەنگین و گران و بە شێواز، زانا، تێگەییشتوو. ـــ ە: ژنی شۆخ و شەنگ و زانا. ـــ ی: سەنگینی و گرانی، شێواز. سەلارە.

**سەلاری** (ئەردە.): قەرە، قەیرە، سەرەژن، کۆنەژن.

**سەلاق**: ئەوکەسەیە ئاژاڵ و ڕەشەوڵاخان دەکووژێتەوە کەوڵیان دەکا.

**سەلاقخانە**: شوێنێی ئاژاڵ و ڕەشەوڵاخ لێ کوژتنەوە.

**سەلاقوچکان**: سەرمەقولات.

**سەلاڵ** (زا.): سەرەوە. سەرسەرەوە، هۆسەرەوە، سەرسەرەوەی چیا، شار یا دەشت.

**سەلام**: شەگگە، سلاو، ڕۆژ و شەوباشی.

**سەلان**: سەرەوە.

**سەلاو**: سلاو: چتێکە یا بەردێکە دەهاوێژرێتە نێو لنگە تەرازووێکی دابێ. سلاو، ڕۆژباشی.

**سەلە**: (باک.) دەفرێکی پانی پووشینە، (کۆ.) سەرتریانە، (هەورا.) نانەشان، خوانە، خوانچە، سەبەتەی نانی، سەلین.

**سەلەب** (باک.): کوڵین و هەڵقەندنی جۆگە و بەند و دەراوان، ـــ کرن: جۆماڵ کردن.

**سەلەشیر**: سەلە و سەبەتەیەکە بەسەر شیری دادەدرێ.

**سەلەشیرک**: جوورە سەلەییێکە قاپ و قاچاخی تێدادەنرێ.

**سەلەف** (باک.): (باک) سەلپەکە، دەستە سوارێکە. سوود، سەلەم. لغاو. نەرمەغار، تاو، تەرات. ـــ بەردان: لغاوشۆڕکردن.

**سەلەفکردن**: غاردانی وولاخ.

**سەلەم**: پێشکڕ، پێشخڕ، (شار.) ڕووپێدە، (هەو.) بەسەر، ـــ دان: بەرووپێدەدان. سەوز، خێز.

**سەلەندە** (باک.): (زا.) گووێسوانە.

**سەلەندۆر** (شن.): شەپکەی بەگەر، شەپکەی گەورە و دەورەدار.

**سەلەبەند** (باک.): سەلە دروستکار، سەلەساز، سەلەچێکەر. (شکا.) تات، تاتەبەرد. (زا.) ووشکەسی.

**سەلپان** (باک.): چڵکن بوون.

**سەلپاندن**: لێخوڕینی بەلەم لە ئاوێدا بەسەوڵە. (باک.) چڵکن کردن، بسەلپینە.

**سەلپەکە** (باک.): دەستەسووارێک.

**سەلپی** (کە.): ئەوداریە، کە قەیاخەوان بەدەستیەوە دەگرن، دارسەوڵە.

**سەلپین** (باک.): چڵکن بوون.

**سەڵت**: گۆشتی لایەکی دەست و ڕانی ئاژاڵییە کە لێ کرابێتەوە. تاک، تەنیا. ڕەبەن، زوگورد، زوگورت، پیادە، سووارە، کەسێکە، کە بێ ژن و منداڵ بێ، بێ کەس.

**سەڵتە:** تەنها کەسێکە، تاکە، تەنیایە. جوورە پۆشاکێکە وە سیخمەی دەچێ، بەڵاَن لە سەرەوەی کەوای لەبەردەکرێ قۆڵیشی وە هی کەوای دەچێ. (هەورا.) چلۆسک.

**سەڵتەدروو:** کەسێکە هەر سەڵتە بدروێ.

**سەڵتەزەلام:** تاکە کەسێکە بە بێ چەک و ڕێبوواربێ.

**سەڵتەیی:** فەرەنجی سەڵتەیی ئەوەیە درێژی بەقەدەر سەڵتەی بێ.

**سەلخ:** بن و دووایی مانگ، پایانی مانگ.

**سەلک:** (خۆ) سەر، سەرک. (باک.) سەلە، سەوەتە، قەرتاڵە. بەینی پیواز و تــوورو چەوەندەر و شێلم و چتی واش دەڵێن. (زا.) سەوەتە.

**سەلکە:** گوڵێکە لە تەونیدا دروستەکرێت بە وێنەی سەری گیان لەبەر، سەلک.

**سەلکەبزووت:** پەلەبزووت، سۆتک، نیمەسۆز، سەرسۆت، سەرسۆتک، بزۆت، سەرەچلۆسک، سەرەبزووت، دارێکە سەرێکی سووتابێ.

**سەلکەتەشی:** کەرتەشی، شەکەرۆکە.

**سەلکدار:** سەوزاییێکە سەلکی هەبێ.

**سەلک کردن:** خڕبوونی سەلکی سەوزایی.

**سەڵماس:** شارێکی کوردانە لە کوێستانێدا.

**سەلنیسە** (لو.): شەوگەرد.

**سەڵمکە:** (کۆ.) سەرکە، سڵمۆکە، سەرکە، گیایەکی بەهارییە بە سوورکراوەوەیی دەخورێ.

**سەڵۆ** (هەورا.): سەوڵ، سەوڵ.

**سەڵۆیی** (هەورا.): سەوڵ، سووراو، گیایەکە گوڵ و پەلکی سوورە هەشە پەلکی سەوز بێ، پەلکی لە هی سڵقی گچکەترە و دەشکرێ بە دۆڵمە.

**سەلوا** (باک.): سەرو (دار).

**سەلوو** (باک.): داری سەروو، (باک.) سەلوا، سەلوی.

**سەلووینک** (جا.): سەرگوویلک، گووفەک.

**سەلوی** (باک.): سەروو، (دارێکە).

**سەڵیتە:** ژنی حیز، سووزمانی، جندە، کـاوڵی، کـەولی، بێ ئـابڕوو و بێشەرم، خوارۆ، ترۆ، دەڕاشۆ، فەلتۆیی، بێ ئاوڕوو.

**سەلیقە:** بڕشت، کارزانی، زیرەکی، سەرشتە، سەرڕشتە، بە ـــ: شاباز، بە هووردە، بەبڕشت. ـــ دار: کارزان، زیرەک، بەبڕشت، شیاو. ـــ داری: کارزانی، شیاوی.

**سەلیل** (باک.): بڵند. ـــ بوون: بڵندبوون، چوونە سەر، سەرکەوتن.

**سەلیلانک** (باک.): باخچەی منداڵان. ڕەوڕەوەی منداڵ، کە پێی فێرە ڕێژییشتن دەبێ.

**سەلین** (باک.): بەردێکە وەکوو کۆڵەکە یا ستوونی بێ. (زا.) پەردەی دەمەڵینی گۆیە.

**سەما:** جوورە هەڵپەڕینێکە بە تاکە کەسێک ئەنجام دەدرێ و جارجارە چەقەنەشی لێدەدا، هەلکە، چۆپی.

**سەمات** (فە.): تەرسەقولی ئەسپ و ئێسترو ماین و ئیتر. ـــ کردن.

**سەماخ:** بۆ مرۆ: بەدەمار، ئازا، نەبەز، بۆ ئاسن: دووای سوورکرانەوەی ئاودانە.

**سەمار:** بزن مژ.

**سەماسی** (باک.): سەگاو.

**سەماکار:** سەماکەر. ـــ ی: سەماکردن.

**سەماکەر:** هەڵپەڕینی تاکی.

**سەماکردن:** بەتەنهایی هەڵپەڕین.

**سەماگا:** سەماگە.

**سەماگە:** سەماگا، شووێنێکی تایبەتیە سەمای تێدا دەکرێ.

**سەمانەک** (باک.): جوورە چۆلەکەیێکی گەورەی قەڵەوە.

**سەماوەر:** سـەماناوەر، ماشینەیەکە چای پێی لێدەنرێ لـە بنچینـەدا دوو تووێیە، تووێیەکی لە ناوەوە ئاتەشخانە و تووێی دەرەوە پردەکرێ لـە ئاو. ـــ تێخستن: سەماوەر تێ ئاوێژتن.

**سەمبەرد** (ڕەوا.): بەردەقسڵ.

**سەمەت:** لەسەرخۆیی، هێمن.

**سەمەر** (مـوک.): سـەیران و خۆشـی، سەیروسـەمەر. (بـاک.) دەسـتە سووار.

**سەمەرە:** سـەیر، بەتـەنها بـەکارنابرێ وەکـوو سەیروسـەمەرە. (ئـەردە.) نوویشـتە، تـەوەرە، بـەش، نیوچاوان، چارەنووس. ئـازار و دەردەسـەری، بەسەرهات، تەمەرە، ئاسیو، کارەسات، گرو گێچەڵ.

**سەمەن:** گوڵ و درەختـی یاسـەمەنە پێنـج گـەڵاَی هەیـە. (ئـەردە.) زەرد، تەڵاَیی.

**سەمەنە** (ڕەوا.): تڵتە و تفری و ترێ و میوەی کوشراوە و ئاوگیراوە.

**سەمەند** (هەورا.): سەمەندۆک.

**سەمەندەر:** جانەوەرێکە گۆیا لـە ئاورێدا دەژی.

**سەمەندکرۆژ:** فیڵمزان، فریوباز.

**سەمەندۆک:** قاییش یـا سیرمە یا قـەیتان و پـەتی جڵـەوی جەنجەڕییە. ئەشکێڵ، کۆکان، بەستنەوەی دەست و پێیەکی وولاَخی بەرزەیە. تـاجی یا سەگێکی بە تەنهایی، کە ببەنە جێگایـەکی دی پـەتی دەکـەن و پەتەکەشی لەسەری دارێکی دەبەسـتن و سـەرەکەی تری دارەکەشی پیاوێک دەیگری بەو جوورە بۆ شووێنی دڵخوازی دەبەن، بـە دار و گوریسـەکەشی دەڵێـن جەڵە، سنک. (هەو.س) جەڵە، سنک، (شێخ.) ڕفـک، چـەند سـەگ یا وولاَخێـک لـە داری درێژ دەخرێن هەریەکەی شەقاوێک لێـک دوور بن بەو جوورە دەبرێنە جێگای دڵخواز. ـــ کردن: جەڵەکردن.

**سەمەنگوڵ:** گیان لە بەرێکە گێژ بێ و کولۆکێکی ساخ نەبێ.

**سەمەنی:** جوورە هەڵواو خواردەمەنیەکە لـە ئـارد و ئـاوی قەرسیلی گـەنمی ناسک دروستەکرێ و لـە سەر ئاوور دەکوڵێنرێ چەند ڕۆژێکی پێدەوێ تا ئەو قەرسیلە پێدەگا و هەڵوایەکە پێکدێ.

**سەمت:** لا، کەنار، قوژ، شووێن، جێگا.

**سەمتاندن** (باک.): لە ئاوی گەرم هەڵکێشان، (بسمتینە).

**سەمتوور:** جوورە سازێکە.

**سەمتین** (باک.): بسمتە.

**سەمیر** (زا.): تڵتەی ترێی کوشراوە.

**سەمڵ:** بەرماڵ.

**سەمۆر** (ئەردە.): سمۆرە.

**سەموور:** سمۆرە، گیانداریکە پێستەکەی زۆر نرخدارە دەکرێ بە کەوڵ.

**سەنا** (ئەردە.): سینامەکی، گیایەکی بەناوبانگە بۆ ڕەوانی باشە.

**سەناتوو** (توو.): سەگ.

**سەناهی** (باد.): ئاسان.

**سەنەد** (ع.): بەڵگە، قاقەز، نووسراو، قەباڵە، قۆچان.

**سەنەڵ** (ئەردە.): سەندەڵ، سمڵ.

**سەنەڵی** (ئەردە.): سەندەڵی، جوورە کەوشێکە.

**سەنەو** (باک.): لوولە، بۆڕی.

**سەنج** (باک.، باد.): داروبەری سنجوو.

**سەنجار:** شەنگاڵە، ژەنگار، ناوی چیاو شارێکی کوردانە، کوردەکانی وێ زۆرترینی یەزیدین.

**سەنجۆل** (باک.): قەڵادەی سەگییە، (باک.) سەنجوور.

**سەنجوور** (باک.): قەڵادەی سەگییە.

**سەندەرووس:** بەردێکە وە کارەبای دەچێ.

**سەندەڵ:** گیایەکە ئەزنۆک پتر بڵند دەبێ گەڵاشی وەهی توتنێ دەچێ و دووڕیزە بەرانبەری یەکتری بەنی پێ ڕەنگ دەکرێ ڕەنگی زەرد دەکات نێرتکەکەی پشتێندێک بڵند دەبی و چووارسووچە بەرەکەی وەکوو قۆدیلەی وایە تۆوی ووردی تێدایە ئەگەر بە کولاوی لەسەر زگی ژانداری دانێن ژانەکەی دەبڕێ. (سەق.) گێنۆ، (خۆ.) سەندەر. دارێکی هیندوستانی و گەرمیانییە بۆنی خۆش و بە نرخە و ڕەنگی سوورە ، شمک.

**سەندەڵی:** جوورە کورسییێکی لەسەر دانیشتنییە. جێگای کەوش لێدا کەندنییە.

**سەندن** (کە.، دەر.): ئەستاندن بە زۆر. کڕین.

**سەندنەوە:** وەڵامدانەوە بۆ گۆرانیی کەسێکی لە شێوەی گۆرانیەکەی. ئەستاندنەوەی چتێکی ، کە لێت ئەستێنرابێ بە زۆر.

**سەنگ:** جوورە یارییەکی پاڵەوانانەیە. (هەورا.) بەرد، کوچک. (ڕەوا.) کەنگری پیر دڕووەکانی لێ کرێتەوە پێی دەڵێن سەنگ. (هەورا.) گرانایی، قورسایی. ئەندازەییێکە لە بەرد یا ئاسن، کە چتی لە تەرازوودا پێ بکێشرێ.

**سەنگانی** (ئەردە.): سەنگایی، ئەندازە، بەرابەری.

**سەنگاندن:** هەڵسەنگاندن، کێشان.

**سەنگانن** (ئەردە.): سەنگاندن، هەڵسەنگاندن.

**سەنگاو** (ئەردە.): دۆڵاو.

**سەنگایی:** قورسایی؛ بە ـ تۆلیرەی هەیە.

**سەنگەر:** حەشاری کەو. سیپە، حەشارگە، شاردنگە، مەتەرێز، تابیە، پارێزگا، وەشارگە، سنگەر، خەندەک، دژ، قەڵا، قوللە. شووێنێکە مرۆ خۆی تێدا حەشاردەدا لە کاتی شەڕێدا، ـ گرتن: سەنگەر داگیر و زەوتکردن، چوونە نێو سەنگەرەوە بۆ شەڕێ.

**سەنگەربەستن:** سەنگەر قاییم کردن.

**سەنگەربەستی:** سەنگەربەندی، قەڵا بەندی، دروستکردنی چەند سوپەرێکە بە گردی شووێنێکیدا بۆ پارازتنی لە دوژمن.

**سەنگەربەند:** سەنگەرچێکەر. ـ ی: سەنگەربەستی، قەڵابەندی.

**سەنگەرپارێز:** قەڵاپارێز. ـ ی: پارێزگاری سەنگەر.

**سەنگەرگا:** قەڵای قایم و مەحکەم.

**سەنگەرگە:** سەنگەرگا.

**سەنگسار:** بەردەباران. ـ کردن: بەردە بارانکردنی کەسێکی تا دەمری. ـ ی: کوژتنی کەسێکی بە بەردەباران.

**سەنگسیر** (موک.): چێشتێکە بە گۆشتی کەروێشک و دژکەشکی لێدەنرێ و ڕۆن و پیوازی بەسەردادەکرێ.

**سەنگەک:** جوورە کولێرەیەکی ئەستوور و درێژووکەیە. ـ ی: سەنگەک، جوورەنانێکە وەکوو لەواشەی وایە.

**سەنگەلا** (کە.): لاسەنگ.

**سەنگەڵ و بەنگەڵ:** ئاڵوگۆز. ـ کردن: گووێزتنەوە.

**سەنگەڵقۆ:** شەیتان؛ دەڵێی ـ یە لە هەموو چتێکیدا ئامادەیە.

**سەنگباران:** بەردەباران، سەنگسار.

**سەنگتراش** (هەورا.): بەردتاش. (هەورا.) ـ ی: بەردتراشی.

**سەنگچن:** بەردچن، کوچکچن.

**سەنگدادان:** لاسەنگ بوونی چتێکی قورس، ئەو لابارە سەنگی داداوە، ئەم دیوارە سەنگی داداوە.

**سەنگدان:** پاڵدان، پاڵ پێوەدان، بروا پێ هاتن.

**سەنگرانەوە:** تۆزێ هەڵوێست کردن، کەمێ ڕاوەستان بۆ بیر کردنەوە، هەڵوێستەکردن، هەر گیان لە بەرێکی لە ڕۆیشتنێدا تاوێکی ڕاوەستێ و بروا سا بە هۆی هەر چیەکیەوە بێ پاشەوپاش بگەڕێتەوە ، ـ ی پێدەڵێن، سڵەمینەوە.

**سەنگزاوەر:** بەردی پازار.

**سەنگزاوەرە:** سەنگەرانەوە.

**سەنگ فەرش:** بەردچن، کوچکچن.

**سەنگ کێش:** بەرد کێش، جوورە دارێکە لەسەر پشتی وولاخی دادەنرێ بۆ بەردکێشانێ.

**سەنگ گا** (ئەردە.): سەنگ زاوەرە.

**سەنگلاخ** (ئەردە.): بەردەلان، کێفسان، (ئەردە.) زربان.

**سەنگ لێنان:** مەبەس لە ڕێزگرتنی کەسێکییە.

**سەنگ لێ نیان** (ئەردە.): سەنگ لێنان.

**سەنگۆ** (خۆ.، باڵە.): پانێر، پارگوێر، گووێلکێکە لە شیر کرابێتەوە.

**سەنگۆڵ** (باد.): سەنگۆ، پارگوێری نێری دووساڵانەیە.

**سەنگ و بەرد:** ناوچۆڕ، تەنگ. ـ نان: ناو چۆڕاندنەوە. بەردێ زۆر لە سەر چتێک دانرێ بۆ دەقگرتنی.

**سەنگ و بەردنان:** گۆشتی ماسی و کەروێشک و قەلەموونە بە ترش و خووێ کراوی چتێکی قورسی لە سەر دادەنێن تا خووێنیان لێ بچۆڕێتەوە.

**سەنگ و سووکی:** بڕیتییە لە چەند و چۆنی کردن لە سەودای چتێکیدا بۆ کەمکردنەوەی نرخی، وەکوو یەک لێ کردنی چەند چتێکی لە لایەن

سووکی و قورسییەوە بە پترکردن و سووکترکردنیان؛ کاروانچیەکە بارەکانی سەنگ و سووک کرد تا وەکوو یەکیان لێهات.

**سەنگول** (زا.): چتی ناشیرین، ناحەز، ئێسک قورس.

**سەنگ و وەزن:** سەنگینی، گرانی، قورسی.

**سەنگیا:** سەرین.

**سەنگ و ماست** (ڕەوا.): کەنگری پیر خاوێنکرێتەوە و بکوڵێنرێ تالاّییێکەی دەڕوا ئەوجا ، کە تێکەڵ بە ماست کرێ پێی دەڵێن سەنگ و ماست.

**سەنگی مەحەک:** جوورە بەردێکی ڕەشە وەکوو هەسانی وایە زێڕ و زێوی پێ تاقی دەکرێتەوە بۆ باشی و خراپی.

**سەنگین:** قورس، گران. لەسەرەخۆ، ئارام، هێمن، بەڕێز، بەڕوو، سەلار، (باک.) ئوودە. داگیراو. داگیریاگ، تەپ، سست، تەمبەڵ، لەشگران.

**سەنگین بار:** بارقورس، گرانبار.

**سەنگین پا:** پێ قورس، شووم، پێ ڕەش.

**سەنگین دەس:** دەستگران، کەسێکە لە ئەنجامدانی کاراندا سست و خاوبێ.

**سەنگین سەر:** سەرقورس، سەرسەخت.

**سەنگین و گران:** هێدی و هێمن، بەڕێز، ئارام، لەسەرەخۆ.

**سەنگینی:** قورسی، گرانی. گرانی و هێدی و هێمنی و بەڕێزی، لەسەرەخۆیی. گرانی، شوومی، نەحسی.

**سەنگین گوێچکە:** کەم بیستن، کەم ژنەفتن، دێرژنەفتن.

**سەنڵ:** سەڵ.

**سەنماندن:** پیسکردن، گلاّوکردن.

**سەنن** (کە.، ئەردە.): سەندن، ئەستاندن. (کە.) کڕین. گێڕانەوە، گلەودان، گلدانەوە، وەرگرتن.

**سەننەوە** (ئەردە.): سەندنەوە، ئەستاندنەوە. لە ئاخۆتن و گۆرانیدا بۆ گێڕانەوە.

**سەنیار** (کە.): کڕیار.

**سەنێر** (هەورا.): پەین، تەرسی ووشک، سەرگین، تەپاڵە، شیاکە، لاس، سەورر. ــ کێش: پەین کێش. ــ گا: سەرە نووێلک. ــ والک: سەرە نووێلک.

**سەنێژ:** شیاکە، تەرس، سەور، لاس.

**سەنیر:** (دەر.) سەرین، سەرینگە، زەمبەریش، رووبالگە، ڕووبالک، سەرنیا، سەرنگیا، نازبالیف، بالین، باڵین، باڵگە، بالگە. (هەورا.، کۆ.، بار.، هەو.): بالیف. (باد.، هەورا.) سەرینگا. پالگوە. ــ کێش: پەیین کێش.

**سەنیری چکۆڵە:** ناز باڵنج، بنسەر، نازبالیف، نازبالگە، (باک.، باد.) بالیفک، بالگۆک. (باک.) بالووفک.

**سەنیزە** (ئەردە.): مرازێکی جۆلاّییە.

**سەو** (دەر.): سەگ.

**سەوا** (ئەردە.): سەودا. (باک.) گەییشتوو (بۆمیوە). (هەورا.) سەواد، خوێندەوا. سبەینێ، بای ڕۆژهەلاّت.

**سەواد:** سیواد، تینی خوێندەواری و نووسین، شارەزای نووسین و خوێندن بوون. بە ــ : خوێندەوار. بێ ــ : نەخوێندەوار. (هەر.) ڕەشەوولاّخ. ڕوونووسی، ڕوونوویشت، ڕوونوویس. ڕەشی، ڕەشانک، ڕەشایی.

**سەوادار** (هەورا.، ئەردە.): خوونەوار، سەواددار، خوێندەوار.

**سەواداری** (ئەردە.): سەوادداری، خوێندەواری.

**سەوادە** (ئەردە.): پیادەییێکی سەڵتی بێ تفاقی، ڕاڕەو، پیادە، سەڵتە.

**سەوادبوونەوە:** بڕشتی نووسین و خوێندن پەیداکردن.

**سەواد دار:** خوێندەوار. ــ ی: خوێندەواری.

**سەوارە** (هەو.): باقەی گەنم و جۆو ئیدی.

**سەواش** (باک.): هاوارو قیڕەیە.

**سەوال** (باک.): چوارپێیانی کەوی، مالاّت و ڕەشە وولاّخ.

**سەواڵە:** قولەگەنێکی درواوە.

**سەواندەر** (باک.): چەوەندەر.

**سەوای** (هەورا.): سبەینێ، (هەورا.) سبەی.

**سەوە** (ئەردە.): گۆزە. سەوەتە.

**سەوەتە:** قانتووف، مەلکەب، سەپەت، سەبەد، سەبەتە، سەوە، سەویی، تریان، سەوەد، (ئەردە.) لەودە، نووپان، قەرتاڵەی زۆر قووڵە میوەی تێدا دەبەنە بازاڕێ بۆ فرۆشتن.

**سەوەتی** (فە.): سێبەر.

**سەوەڕ:** سەگوەڕ.

**سەوەشیر:** (موک.) شیرەوانە، (خۆ.) کۆلین، خەشیو، قەرتاڵەیەکی گەورەیە شیرو ماست و گۆشت و چتی دیکەی وەبندەدرێت.

**سەوچیان:** پۆڕیان.

**سەودا** (باک.): هۆش، ژیری. ڕەشانک، ڕەشائی، بیروو، وولێن. کەڵکەڵە، هەوا، گراوی، دڵداری، خولیا، سۆز، والاّمەن. ــ ی ژنهێنانی لە کەللەدایە. تێکەولێکە، مامەڵە، چەند و چوون لە کڕینی چتیدا، داد و بست. خارشت، خوروو، گەڕۆلی، خورشت. دەردێکی زۆر بە ئالۆشە لە پێستی مرۆیاندا پەیدا دەبێ، دەست و پێی دەقەڵشێ، ئەم نەخۆشیە، کە چارە نەکرێ دەبێتە ئاتەشەک، ئەو کەسەی ــ ی هەیە دەبێ پارێز لە هێلکەو پیواز و باینجان و چەوری ساخ بکات ئارەقی شاتەرەو یا ئاوی شاتەرەی کولاّو بۆ خارشتی سەودا بخورێتەوە و شووێنی خورشتداری پێ تەڕکەی زۆرباشە. نیشانەی سەودای بەڵغەمی: هاوینان خورشتی پەیدادەبێ، کەورشک بوو دەقەڵشێ و توشکێکی سپی دەدات و خارشتیشی هەیە، خۆڵ وەسەرە (ریحانەی فەقێیانە) بەتەڕی یا بە ووشکی لەگەڵ ئاوێ بکرێ بەیانیان لە خورێنی ئیستیکانێکی لێ بخورێتەوە بۆ سەودای بەڵغەمی گەلێک باشە، بۆ برینی سەودا و خارشت و برینی کۆن: هەلیلەی ڕەش، سینامەکی لیمۆی بەسرایە ، تەمری هیندی هەریەکەی ١٢ مسقالّی تا چەند کەژمێرێکی بکوڵێ و لە خورێنی بخورێ زۆر باشە ، گۆگردی زەردی زێڕین ٣جار هەر جارەی دووای هاڕینی کەوچکێک چای لێ بخوا ئاوی بەسەرداکا و (شۆرە) ش کەوچکێکی چێشتی لە ئاوبکرێ ڕۆژی ٣ ، ٤ جاران برینەکانی پێ تەڕکات باشترین دەرمانی خارشتە.

**سەودادار:** عەوداڵ، گراو، دێوانە، سەوداسەر، دڵدار. کەسێکە گرفتاری نەخۆشی و سەودابێ، سەودایی. ـــ ی: عەوداڵی، دێوانەیی، گراوی.

**سەوداسەر:** سەودادار، عەوداڵ، گراو، دیوانە، ئەبداڵ، ماخۆلیا، دڵدار، دڵبراو، والە، والاّمەن، حەوداڵ. کەسێکە کەڵکەڵەی چتێکی کەوتبێتە سەری. ـــ ی: سەوداسەری، گراوی، دێوانەیی.

**سەوداکردن:** تێکەو لێکە کردن، چەند و چوون کردن لە کاتی کڕینی چتدا.

**سەوداگەر:** کەسێکە سەودای کڕین و فرۆشتنی بکات، بازرگان.

**سەوداگەرێتی:** پیشەی کڕین و فرۆشتن.

**سەوداگەری:** خەریکی کڕین و فرۆشتن بوون.

**سەودان** (باک.): هۆش، ژیری.

**سەوداوی:** چتێکە بۆ دەروی سەودا گەندبێ.

**سەودای کۆن:** ئاتشەک.

**سەودایی:** نێوی پیاوانە. نەخۆشی سەودا، کەسێکیشە نەخۆشی سەودای هەبێ. دڵداری. ـــ دار: خارشتدار. ـــ داری: خارشتداری.

**سەودەسەر:** سەوداسەر.

**سەور** (ئەردە.): ئارام، هێواش. سەنێر، شیاکە، تەرس، لاس، سەرگین. (باک.) ستەورر، شارێکی کوردانە لە ڕۆژاوای شاری ماردینییە.

**سەورگا** (ئەردە.): سەنێرگا، سەریوان، سەرگوورێلک.

**سەورگە** (ئەردە.): سەبرگە.

**سەوڕۆ** (هەورا.): تەپاڵە، شیاکە.

**سەوری** (شوا.): نێری.

**سەوز:** شین، ڕوواو، شینایێکە دەمی دابێ. کەسک، جوورە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی گیا، سەبز.

**سەوزاو:** جوورە ئاوێکی سەوزە دەچێتە ناو پەردەی چاوی هێندێ کەسەوە کوێری دەکا، ئاوی ڕەش.

**سەوزایی:** کەسکایی، شینایی. شیناوەردی.

**سەوزە:** مرۆی گەنم ڕەنگ. جوورە گۆرانییێکی خۆشە. سەوزەوات، (باد) پنجار. گیا.

**سەوزەفرۆش:** (باد) پنجار فرۆش.

**سەوزەکۆ** (ئەردە.): خومەرەژە.

**سەوزەکووا** (ئەردە.): کەندەسمە، ڕەنگاڵە، خومەرەژە.

**سەوزەلان:** شووێنێکە سەوزایی و گیای زۆر بێ، سەبزەزار، مێرگ، شیناوەردی. ـــ ی: سەوزەلان، چیمەن، مێرگ.

**سەوزەوات:** چەند جوورە سەبزەیێکە.

**سەوزە وورەش** (هەورا.): سەوزە فرۆش.

**سەوزەی مەحاڵی:** جوورە سەوزەیێکە لە مەحاڵی موکریانێدا داڕژاوە.

**سەووز بوون:** ڕووانی گیا، مەبەس لە سەرگرتنی کارێکیشە، کارەکەی... سەووز بوو.

**سەووز خەڕ:** کڕیاری دانەوێڵە و میوە و شینایییە لە پێش پێگەییشتنیدا.

**سەووز فرۆش:** سەوزە فرۆش. کەسێکە هەربە سەوزی داهاتی خۆی بفرۆشێ.

**سەووزکڕ:** سەووز خەڕ.

**سەووزکردن:** مەبەس لە بنیات نانی کارێکییە؛ ئازاد چتێکی سەووز کردووە: بنیاتی ناوە.

**سەوزی:** کەسکی، سەوزایی، شینایی. (هەورا.) سەوزەوات، گیا و گۆتەڵی خواردنێ، پنجار، تار، میوە. ـــ فرۆش: تەرە فرۆش، کەسێکە سەوزی بفرۆشێ. ڕەنگی کەسکی.

**سەوس** (باک.): تاوان، سووچ.

**سەوقات:** دیاری، دەس ئاوێز. (ئەردە.) ـــ ی: ئەو چتەیە بە دیاری بنێردرێ. قەرتاڵە، چنگڵە، سەلە.

**سەوک** (باک.، زاخ.): هەنجیری ووشک. (باک.، زا.) کوللێرەی شەکری. نانی تیری. (زاخ.) کوللێرە، ئەستوورک.

**سەوکاسەێ** (باد.): سەولەی سەگی، کە لە کەپەکی دروستدەکرێ، (دزە.) سەپکە.

**سەولا هەنجیرێ** (باد.): نانی هەنجیری.

**سەوگراندن** (باک.): دڵنیاکردن، ئەرخەیاندن، بسەوگرینە.

**سەوگور** (باک.): سەگوور. (باک.) ـــ ی: سەگووری.

**سەوڵ:** دارسەوڵە، درووداری درێژی سەرپانە، بەلەم و کەڵەکی پێ لە ئاودا بەڕێوەدەبرێ. (کەل.، کە.، هەورا.) داری سەروو. (کەل.، کە.، هەورا.) گیایەکی دەستچێنە و بۆنی خۆشە گوڵەکەی وە پۆپەی کەڵەبابی دەچێ، ڕەنگە سووراوبێ، گەلاّی پانە.

**سەوڵە:** ئاژۆتنی بەلەم یا کەڵەکە لە سەر ئاوێ بە هۆی جووتە دارە درێژ و دروسەرپانەکانی تایبەتی سەوڵەوە. دارسەوڵە.

**سەولە:** نانی کەپەکییە بۆ سەگ و وولاّخان، سەولەی سەگی، سەپک، نووالە.

**سەوڵەلێدان:** بە دوو داری درێژی سەرپان بەلەم و کەڵەکی بە ئاوێ بێڕەو بەوێ ئاژۆتن.

**سەولک:** ئەستێولک.

**سەولی:** سەرەوە، لای ژووروو.

**سەوونچک:** گیایەکە مسکی بەوەوە دەسووتێنن تا بۆنی خۆش بدات.

**سەولی خەرامان:** سەروی خەرامان.

**سەووک** (ئەردە.): تەڕدەست، زرنگ، چابوک، دەست سووک.

**سەوهان** (هەورا.): هەسان.

**سەوی:** سەوەت، بەرچینەی گەورە.

**سەوینە** (سو.): چەتر.

**سەویک** (ئەردە.): کوللێرەی ناوشکێنە. گۆزە.

**سەویل** (باک.): گۆزە، سەبیل.

**سەویلک** (باک.): گۆزەڵە.

**سەوین** (ئەردە.): جوورە دەفرێکە.

**سەهەن** (کە.، هەورا.): نزار، نسار. بە نیسێ و جێگای سێبەردار دەڵێن، کە لەبەرقەد یا لە داوێنی کێواندا، کە هەتاوی هەرلێ نەدا یا کەمی لێدا جا ئاو و شینایی هەبی یانا. (زەن.) تەپاڵە، دەوەکێویلە. سەهەند، سێبەری چڕ، نیسێ.

**سەهەنە** (ڕژ.): بێ گوێ، لاسار، نگریس، (موک.) سەهەندە.

**سەهەند**: نێوی پیاوانە. سەهەن، سێبەرچڕ، سایە. نێوی کێوێکییە. (کە.) نێو دارستانێکە تەڕ و فێنک بێ.

**سەهەندە**: لاسار، بێ گوێ، سەهەنە.

**سەهیا** (باک.): سێپایە، سێدارە.

**سەهریج**: سارداو، سەرداو، ساردگە، تیپی (ج) بۆ شوێنە وونکە لێی پتر کراوە دەنا لە بنچینەدا ساردگەیە و کوردییە.

**سەهرینج** (باک.): سارداو، سەرداو، گۆلاو، عەنباری ئاوێ.

**سەهگوور** (باک.): سەگورر.

**سەهنە**: سەهندە، بێ گوێ، نەژنەوا.

**سەهندە**: سەهەند، لاسار، نگریس، بێ شەرم، بێ ئابڕوو، بێ گوێ، (ڕژ.) سەهەنە، لاسار. ــ یی: لاساری و نەگریسی.

**سەهۆڵ**: (خۆ.) ڕمە، (باک.) کاک، کر، (هەورا.) بەیسە، یەخ، (کە، هەو.) شەختە، قاقا، قەشا، قیر، ئاوێکە لەبەرتەووژمی ساردی و سڕی بەستبێتی. ــ ی سپی: خوێسک.

**سەهۆڵاو**: ئاوێکی ساردە، کە بە سەهۆڵ گیرابێتەوە. ــ اوی: ئاوێکە پڕ لە سەهۆڵبێ.

**سەهۆڵبەنان**: سەهۆڵبەندان.

**سەهۆڵبەندان**: (هەورا.) یەخبەندان، شەختە، بەستەڵەک، (زەن.) ماسیان، کاتێکە لەبەر سەرماو سڕی ئاو بەستبێتی و بووبێتە سەهۆڵ.

**سەهۆڵ خانە**: ژوورێکی گەورەی تایبەتیە زستانان پڕدەکرێ لە ئاوو دەیبەستێ و هاوینان سەهۆڵەکەی دەفرۆشرێ، مرازێکە یا شوێنێکە سەهۆڵی تێدا دروست بکرێ، زۆزانیک، سەهۆڵکار، بەفرکار.

**سەهوو**: سام.

**سەهین** (هەکا، هەورا.): سێبەر، نیسێ.

**سەی** (باک.): سەگ. (هەورا.) سێبەر، نیسێ.

**سەیاڤ** (باک.): سەگاو، سەکلاو.

**سەی ئاڤێ** (باک.): سەگاو.

**سەیاندن** (باک.): تێ هەڵسوون، سوواخدان، بسەیینە.

**سەیحوون** (ئەردە.): زێی سەیحوون.

**سەیدا** (باک.): مامۆستا، وەستا. (باک.) ــ تی: زانیاری، شارەزایی.

**سەیدادەستی** (باک.): سەواد.

**سەیدک** (باک.): بەشە هەرە ساردییەکەی زستانێیە، چلەی زستانێ.

**سەیدۆکە** (ئەردە.): ستک.

**سەیدووکە**: (سەق.) سەرتیکە، هاتیکە، (شو، کە.) ستک، گیایەکە سێ بست بڵند دەبێ و بەرەکەشی لە نۆکێ گەورەترە و دەخورێ.

**سەیر**: عەنتیکە، حەنتیکە، ناوێزە، (هەورا.) ناشنا، چتێکە مایەی سەرسووڕمانێ بێ. تەماشا، ماشا، چوومەــ ی باخان. گەڕان، گەڕیان، گەشت، گێڵ.

**سەیرارا**: گوڵێکی باریکی لاسک درێژە رووی دەرەوەی پەڕەکانی سوورە و هی ناوەوەیان نیوەی سەوز و نیوەشی ڕەشە.

**سەیران**: تەماشا.سێران، گەڕان، گەشت، پێ گەرمۆک، گێلی.

**سەیرانکار**: سەیرانکەر، سەیرانگەڕ.

**سەیرانکردن**: چوونەسەیران.

**سەیرانگا**: سەیرانگە، شوێنێکە سەیرانی لێبکرێ، گێڵگە.

**سەیرانگە**: سەیرانگا، وار، هەوار، سەیرانگەه، گۆڕانگە.

**سەیرە** (موک.): باڵندەیێکە بەزەردی دەنووێنێ لە چۆلەکەی گچکەترە، دەنگی خۆشە و کەوی دەکرێ.

**سەیرکار**: تەماشاکار، سەیرانکار.

**سەیرکردن**: چوونە سەیران. تەماشاکردن. چوونە سەیرانێ.

**سەیز** (هەو، بابا، کە، ڕەوا.): مەیتەر.

**سەیزان** (ئەردە.): ژێرزەمین، سەرداو، ژێرزەویــن، سارداو. ــ خانە: بارگە، بنەگە.

**سەیس** (بار، گەتو.): خرت، خەرتی دوو ساڵانەیە. ــ خانە: بارگە، بنەگە.

**سەیفکی** (باک.): جوورە بوورزوێکە.

**سەیڤان** (زا.): ڕاوچی. سەیوان.

**سەیل** (ئەردە.): سێلاو، لافاو.

**سەیلاو**: سێلاو.

**سەیلاوکەن**: کەندێکە سێلاو دڕیبێتی.

**سەیلگا**: لافاوگە.

**سەیلاخ**: (دزە، هەو، شوا.) کەنار ئاو و جۆگە و رووبارێکە هەمیشە تەڕایی و غەی هەبێ و بێستانی لێ بەرهەمبێ. زەوی و ئەردێکە ئاوکێربێ.

**سەیوان** (هەو.): چەتر. خێوەت. ناوی گردێکییە لە قەراخ شاری سلێمانی و گۆڕستانی شارەکەیە. (هەو.) کەپرێکە بۆ سێبەر دروستکرابێ.

**سەییز**: بڕوانە: سەیز.

**سەییس**: بڕوانە: سەیس.

**سبا** (باک.): سپێدە، ئەسپێدە.

**سبات** (باک.): ڕەشمە، شبات.

**سبانە**: قەراخ، کەنار، کۆبەی پۆشمەنی.

**سبە** (ئەردە.): سبەینێ. ــ تر: دووسبەی. ــ ی: سبەینێ. ــ ینان: کاتی بەیانیان. ــ ینە: سبەی. ــ ینێ: ڕۆژی دووای ئەو ڕۆژەی تێدای، (هەورا.) سەبای، سبەی. ــ ینیان: سبەینان.

**سبحانگوول** (باد.): زرێبارێکی گەورەیە لە هەرێمی وانێ بڕوانە گوولا سبحانێ.

**سبحەینێ**: سبەینێ.

**سبزوو** (دەر.): سبەینێ زوو.

**سبۆرە**: سمۆورە.

**سبۆزی** (ڕژ، شەبە.): سبەینێ.

**سبێ**: سەبا، سۆزی.

**سبێنی**: سبەی، سبەینە، سبەینێ.

**سبیل:** سمێڵ. (لور.) سەبیلە.

**سپ:** تەواو، دەق. ـــ سپایە: تەواو ڕەشە.

**سپا:** لەشکر، قۆشەن. ـــ بود: سەرلەشکر.

**سپات (هەورا.):** سپی واش، سپی پات، ڕەنگێکە بە سپی بروانێ، نەباتی، زەردێکیشە بەسپی بروانێ. بێ ڕەنگ، کەمڕەنگ. ـــ وبێ تام: بێڕەنگ و بێتام.

**سپاخانە:** لەشکرگە، لەشکریەز.

**سپادار:** لەشکردار، سەرلەشکر. ـــ ی: لەشکرداری.

**سپارانی:** لەشکرگێڕی، لەشکر کەشی.

**سپارە:** سپاردە. ـــ یی: چتی سپاردە، ئەسپاردەیی.

**سپارتن** (باک.): ئەسپاردن، سپاردن.

**سپاردە:** چتێکە بە کەسێک ئەسپێردرابێ بۆ چاودێری، ئەسپاردە، گرک، تەلپ. بەرێکراو. ـــ یی: ئەسپاردەیی، چتی ئەسپاردە و ئەسپێردراو.

**سپاردن:** ئەسپاردن، دانانی چتێک لەلای یەکێک بۆ ئەوەی چاوەدێری بکات. ڕاسپاردە. بەرێکردن.

**سپاس:** سوپاس، شوکر، ستایش.

**سپاسالار:** سەرلەشکر، سەرداری لەشکر، سپادار.

**سپاسبژێر:** سوپاسبژێر. ـــ ی: سوپاسبژێری.

**سپاسکار:** سوپاسبژێر، کەسێکە سوپاسی کەسێکی تربکات.

**سپاک:** سەگ.

**سپاکۆ** (ناوێ.): دێڵەسەگ.

**سپاگا:** سوپاگا، هێز، سپاخانە.

**سپاناس:** پسپۆری سپایی. ـــ ی: پسپۆرێتی سپایی.

**سپاه:** لەشکر.

**سپاهی:** پێشمەرگە.

**سپایی:** سوپایی، پێشمەرگەیی. ئەسپایی.

**سپە** (جبا.، کا.، زەن.): سەگ. (باک.) ئەسپێ، سپێ.

**سپەر:** قەڵخان، سەنگەر.

**سپەردە:** سپاردە، ئەسپەردە. ئەسپەردە، بریاک، پێچراوەوە.

**سپەردن:** بەخاک ئەسپاردن.

**سپەلێک** (باک.): قالۆچەی داران.

**سپەناخ:** ئەسپەناخ.

**سپەنگە** (باک.): چوارپایە.

**سپەهـ** (ئام.): ئەسپێ.

**سپەهی** (باد.): چتی زۆر چاک. (باک.) ڕەندی، چەلەنگی، شۆخی، جوانی، شەنگی. ـــ بوون: شۆخ بوون. (باک.) ـــ تی: جوانێتی.

**سپر** (باک.). باز، سەقر، هەڵۆ.

**سپسان:** ترێی خڕسک، ترێ کێویلە.

**سپڵ:** (باد.) خالخالک، (ڕەوا.) درنخۆشکە، بە سپەلاکیەوە یە بەبێ کاری و نەخۆشی پتر دەبێ، (خۆ.) فاتەڕەشە، بۆ ئەمە ناوی گەلابی خوساو شەووڕۆژ دوو فینجان بخورێتەوە زۆر باشە، دەردێکیشە لە سپڵ پەیدا دەبێ، پارچە گۆشتێکی شینکارە بە جەرگەوە بەلای چەپی گیاندارەوە.

**سپڵ:** خالخاڵک، (باک.) دژی کولاۆ لەناو توورەکەیەک دەکرێ، کە خەست بۆوە پێی دەڵێن سپل و کەشک لەو دروستەدەکرێ.

**سپڵە:** بەدنمەک، بێ نمەک، نانکوێر، نانکۆر، کەسێکە چاکەی لە بەرچاو نەبی، پێ نەزان.

**سپڵەووت:** (هەر. جا، زەن.): سەگ.

**سپڵەیی:** بەدنمەکی، بێنمەکی، نانکوێری، نانکۆری، لە بەر چاو نەبوونی چاکەی خەڵک.

**سپڵدار:** تێرۆلیمان، کەسێکە گرفتاری نەخۆشی سپڵی بووبێ. ـــ ی: نەخۆشی سپڵی گرتنەوە.

**سپلک:** گڵەسپی.

**سپڵۆ** (لو.): سەگ. ـــ ت: سەگ، کسۆک. مندار، مردار، گڵاو. گلاو.. ـــ تی(ئەردە.): گڵاوی، ناوەگلی، حەفتاوی.

**سپڵۆک:** سەگ، گڵاو.

**سپڵووینک:** دارێکی ووشکی کەوتووە، کە لەبەر کۆنی سپی هەڵگەڕابێ.

**سپڵی لاوورگ:** مەبەس لە کەسێکییە، کە نەتەوێ و هەمیشە خۆت تێهەڵقورتێنێ.

**سپندک** (باک.): سپنگ، ئەسپنگ.

**سپنک:** ئەسپنک.

**سپۆن:** ئەسپۆن.

**سپۆنەکێویلە:** گیایەکە.

**سپۆون** (دەر.): ئەسپۆن.

**سپە** (باک.): ئەسپێ.

**سپهک** (باک.): ئەسپێ.

**سپێ** (باد.): ئەسپێ، مۆریانە.

**سپێتی:** سپیایی، سپیاهی، سپیتی.

**سپێدە:** کاتی بەیانی زوو، بەری بەیانی، سپینە، (باک.) ئەلند، کە کەناری ئاسمان ڕووناک دەبێتەوە.

**سپێر:** سوپەر، سپەر. بە تەنێ بەکارنابرێ، ڕێ سپێر: ڕێ بڕ.

**سپێرراو:** سپاردە.

**سپێکە:** جوورێکە لە ترێی دەنک درێژی پێست ئەستووری سپی زۆر شیرین.

**سپێگەنم:** ئەسپێی گەنم.

**سپێناخ**(هەورا.): ئەسپەناخ.

**سپێنە** (بار.): هۆرە، سپیاتی. (باک.) سپێدە. (باد.) دارقایە، دارێکە وەبەر مێوەی بدرێ. ـــ ی چاو: (باد) سپیکاچاف، (ڕەوا.) سپیلکی چاو، (هەورا.) چەرمایی چەم، چەرمێنە.

**سپێنەی هێلکە:** بەشە سپیەکەی هێلکە.

**سپێوکە** (باک.): جوورە گەنمێکە.

**سپێوون:** ئەسپێرون. ـــ ی: ئەسپێرونی.

**سپی:** ڕەنگی سپی یا چتی سپی و بێ پەڵە. چوڕ، چەرمگ، دژی ڕەشییە. (باک.) ئەسپیێ. (دەل.) چەرمی، (هەورا.) چەرمەک، چەرمیک، (دەر.) چەرموو، (جا. هەورا.) چەرمە، (زەن.) چەرمووگ، (باک.) گەوور، سۆڵ (سپی و سۆڵ)، جوورە ڕەنگێکە وەکوو تەرزە و مەرمەرە. ڕەنگی بەفری سپییە.

**سپیاڤ** (باک.): سپیاو.

**سپیان:** مەڕ و گۆشتی مەڕ، دژی سیاو. مەڕ و بەران، (ڕەوا.) سپی. گوشتی ـــ: گۆشتی مەڕو بەرانان.

**سپیاو:** دەرمانێکی ووردی سپییە لە قەلاّیی و هێندێ چتی تری دروست دەکەن ژنان ڕوی خۆیانی پێ جوان دەکەن، سپیاڤ. هێلکە وشۆرباو. ـــ کردن: سپیاو لە دەم و چاو هەڵسوون.

**سپیاوۆکە:** هێلکاو، هێلکە و شۆرباو.

**سپیاهی:** سپیایی.

**سپیایی:** سپێتی. مەبەس لە شیر و ماست و دۆ و کەرەیە.

**سپی بوون:** سپی هەڵگەڕان، ترسان. ـــ ەوە: کاڵبوونەوەی ڕەنگی کەل و پەلان.

**سپی پات:** ڕەنگ سپی، ڕەنگێکە بە سپی بروانێ، سپات.

**سپیتاهی** (باک.): سپێتی.

**سپیتک:** (بیت.): کەڵبەشە، کەربەشە.

**سپیتی:** سپیتاهی، (باک.) سپێتی.

**سپیچەرۆک** (باک.): ڕەنگزەرد.

**سپیچەلۆک** (باک.): ڕەنگ زەرد.

**سپیچک:** سپێنەی هێلکەی.

**سپیچۆلک** (باک.): سپی چڵکن.

**سپیدار:** چنار، ئەسپیندار، پەلک.

**سپیدا کۆترا:** سپێدەی بەیانی زوو لە ڕووی ئەوەوە، کە کۆتر بەیانیان زوو لە خەو بێدار دەبێتەوە دەست بە گمەگمی دەکات بۆیە پێی دەڵێن سپێدا کۆترا.

**سپیدە:** سپێدە.

**سپیدەبالاّ:** ڕووناکیەکە لە پێش بەیانیاندا بەرز دەبێتەوە بۆ ناوەڕاستی ئاسمان.

**سپید پەهنا:** ڕووناکیەکە لە دووای سپیدبالاّ بە ئاسۆی ئاسماندا پەخش دەبێ.

**سپیدارنکە:** نەخۆشی و ئازارێکە تووشی دەغلاّن دەبێت.

**سپیرۆژ:** ڕۆژێکە هەتاو کەمی بە دەرەوە بێ یا لە بن هەورێکی تەنکی سپیدابێ.

**سپیسنک** (باد.): پەرسلێرکە.

**سپیک:** سپێنە.

**سپیکاچاڤ:** سپێنەی چاو.

**سپیکار:** کەسێکە ناو ژوور و هەیوان و دالاّنان گێچکاری بکات. ـــ ی: گێچکاری ناو ژوور و ئەیوان و دالاّن و بێلاّیی و ئیتر.

**سپیکا هێکێ** (باک.): سپێنەی هێلکەی.

**سپیکە:** جوورە ترێیەکی دەنک درێژی تفر ئەستووری زۆر شیرینە.

**سپیکەر** (باک.): مسگەر.

**سپی کراو:** پاکراو.

**سپی کردن:** چەرمووکردن، تێکوڵ لێکردنەوەی خەیار و پیواز و ئیتر. کەوڵکردن، گوورووئی پێستی گیان لەبەران. سەرووپێ خاوێنکردنەوە. ـــ ەوە: قاپ و مسی ژەنگاوی سپی کردنەوە بە قەلاّیی.

**سپیکردنەوە:** گێچکاری کردن.

**سپیلە** (باک.): شەپۆلی کەفاوی. شەنەیێکی دارینی دەنک باریکە چەرم لە پەنجەکانی دەگیرێ.

**سپیلک:** جوورە گوڵێکی کێوی و سپی و بێ پەڵەیە. گڵەسپی. ماینی سپی بێ پەڵە، سپی واش، ئەسپی سپی. (ڕەوا.) ـــ ی پێ: لای پێشەوەی لوولاکییە لە چۆکیەوە تا پشتی پێیان، لاڕەقاییەکەی لوولاکییە، کە لە لای پێشەوەیە، ئێسکی لوولاکییە. جێگایەکە گڵی سپی بێ وەکوو ـــ ی گولەکی، کە لەسەر ڕێگای ڕەواندزێیە.

**سپیلکاچاڤی** (باد.): سپێنەی چاو.

**سپیلکا هێکی** (باد.): سپێنەی هێلکەی.

**سپیلکە:** جوورە مازوویەکە پێستەی پێ خۆشدەکرێ. (بابا.) جوورە ترێیەکە.

**سپیندار** (ڕەوا.): ئەسپیندار، سپی دار، سپیندار، چنار.

**سپیواش:** سپیلک، چتێکە کەمێک سپی بێ.

**سپی هەڵگەڕان:** ڕەنگپەڕین لە ترسان یا لە بەر نەخۆشی.

**سپی هەڵگەڕاو:** ڕەنگ پەڕیو یا لە ترسان یا لە بەر نەخۆشی.

**ستا:** هەڵنان، بە تەنێ بەکارنابرێت، خۆ ـــ: خۆ هەڵنێر.

**ستار** (کە.): ئارام، هەراس، حەجمین. ـــ لێهەڵگرتن: هەراس لێهەڵگرتن. هێدی. ـــ نەدان: ئارام نەبوون.

**ستارە:** دیوارێکی نزم و کونکونە بە گردی سەربانیدا دەکرێ. ئەستێرە.

**ستاربوون:** نوستن، دامەزران، حاوانەوە، زۆرتر بۆ کەسێکی بەزۆز و بێشەرم بەکاردەبرێ.

**ستارخانی:** جوورە کەوایەکە وەکوو مراد خانی وایە، بەلاّم ئەم ئێخە ناوەڵەو چەسپترە.

**ستارکردن:** ئارام گرتن.

**ستارگرتن:** ئارام گرتن.

**ستارلێهەڵگرتن:** ئارام لێهەڵگرتن.

**ستاڤ** (باد.): تیشکی هەتاوی، هەتاو.

**ستان:** مرازێکە بە دووای هەندێک ناوانەوە دەنرێ دەیکاتە ناوی شووێن وەکوو: کوردستان، دارستان، گوڵستان، بێستان.

**ستاندن:** ئەستاندن، سەندن، گەلێک جاران بۆنی زۆر و خورتی هەیە. ـــ ەوە: ئەستاندنەوە، چێشت لە سەر ئاوورگ داگرتن، سەندنەوە.

**ستانک** (باد.): زەردەواڵە.

**ستاییش:** پێهەڵکوتن. ـــ ت: هەڵنان.

**ستە** (باک.): ئەستێ، چەخماغ. ـــ و بەرد: ئەستێ و بەرد.

**ستەرک** (ڕەوا.): پێرک، هەرزاڵ. مێزی لەسەر نووسین.

**ستەکان** (باک.): ئیستیکان.

**ستەگان** (باک.): ئیستیکان.

**ستەم**: ئازار و سزا بە ناڕەوا، بێدادی بە زۆر. چتی گران و بە ئەرک، ناستەم: بەشەوی بەفر و سەرما زۆر ستەمە بێمەدەرێ.

**ستەمدیدە**: کەسێکە زۆر ستەمی لێ کرابێ.

**ستەمکار**: کەسێکە زۆر ستەم بکات لە مەردوم، زۆرکار. ـــ ی: ستەم و زۆرکردن بە پیشە.

**ستەمکردن**: چرووساندنەوە. زیان و ئازاری ناڕەوا بەم و بەو گەیاندن.

**ستەمگەر**: زۆردار.

**ستەنک** (باد.): زەرگەتە.

**ستەو** (باد.): ئەستێ.

**ستەوور** (باک.): بێبەر، ئەستێوور، بۆ وولاّخ و ئاژا لێک بەکاردەبرێ، کە زاوزێیە نەکات و نەزۆک بێ.

**ستر** (باد.): پەیژە.

**ستران**: (باک.) گۆرانی، بسترە. (باک.) ـــ بێژ: گۆرانی بێـژ. ـــ بێژی: گۆرانی بێژی. ـــ اندن: گۆرانی کوتن، تێهەڵکردن.

**سترانڤان** (باک.): گۆرانی بێژ. (باک.) ـــ ی: گۆرانی بێژی.

**سترە**: جلیسقە.

**سترد** (ژا.): نەردیوان.

**ستردە** (ئامێ.): نەردیوان.

**سترک** (باک.): چرێش.

**سترۆ** (باک.): شاخی وولاّخانە، ستروو.

**سترۆه** (باک.): شاخی گیانداران.

**ستره** (باک.): شاخی وولاّخان، قۆچ. درِوو، ستری.

**ستری** (باد.، باک.): درک، درِوو، تووترک، (دەر.) درِەی.

**ستری بە لۆق** (باک.): گیایەکی کێوییە.

**ستری بەلۆک** (باک.): گیایەکی کێوییە.

**ستری برِک** (باک.): درِووکەر، دارێکی دووپەلە درکی پێ دەکێشرێتەوە و دەشکێنرێتەوە.

**ستری مشک** (باک.): گیایەکە.

**سترِین**: ئەسترِین.

**سترین** (باد.، باک.): گۆرانی گوتن.

**سترینگەه** (باک.): بەندەر، دەربەند.

**ستک**( کۆ.، شوا.، کە.): سەیدوکە، گیایـەکی بەهارییـە لـە کـاتی جۆ دروونێدا بەکاربێت هێشوودارە و شیرینەو دەخورێ.

**ستکر** (باک.): نێخە.

**ستلّ**: سەتڵ.

**ستماندن**: هەڵوەشاندن، وێرانکردن، بێدادی کردن.

**ستنگ** (باک.): زەرگەتە.

**ستۆ** (ئەردە.): هەراسان. (باک.، باد.) ئەستۆ.

**ستۆبەن** (باک.): گەردنبەند، تۆق، قەلاّدە.

**ستۆهارێز** (باک.): شاڵگەردن، ملپێچ.

**ستۆک** (باک.): مل، ئەستۆ، تەنها بۆ بێ گیانانە.

**ستۆکەوە** (باک.): جوورە بوزوورێکە.

**ستۆه** (باد.): ئەستۆ، بۆ گیان لەبەران.

**ستو** (زا.): ئەستۆ.

**ستووخووار** (باک.): جوورە گەفێکە.

**ستوور** (باک.): ئەستوور، بەتین، قایم، مەحکەم.

**ستوورەهن** (باک.): شاخ، قۆچ، (باک.) قلووچ.

**ستووری** (باک.): هێز، تین، زۆر. ـــ لێکردن: زۆر لێکردن، سووێند بۆ گەواهی خواردن. ئەستووری.

**ستووڤدان** (باک.): لە ئەستۆدان، گەواهی دان.

**ستووکوور** (باک.): ئەستۆ، گەردن و مل، ستۆکور، پژمل.

**ستوون** (باک.، بار.، ڕەوا.): کۆڵەکە، ئەستوندە، ڕیزە نووسینێکە، کە لە سەرشان بێتە خواریّ.

**ستوونە**: کۆڵەکەی ڕۆژێ واتـە ئـەو تیشکەیە، کـە بـە ڕۆچنـەو کونـی سەربانیدا شۆڕ دەبێتەوە ناو ژووریّ.

**ستووندە**: ستوون، ئەستوندە، چەلەگە، ئەستوندە درێژەکانی ڕەشماڵان و ئیدیکە، هەسوون، دیرەک، کۆڵەکە.

**ستوونی**: چتی ڕاستی قیت.

**ستووهاتن**: هەراسان و سەخڵەت بوون.

**ستێر**: ئەستێری ئاویّ، ستێری ئاویّ. (باد.) ئەستێرە.

**ستێرە** (باک.): ئەستێرە.

**ستێرک** (بار.): هەرزاڵ، پێرک.

**ستێرک** (باک.): سندووقێکە دەغڵی تێدا هەڵدەگیریّ.

**ستێرناس**: ئەستێرەناس.

**ستێرنیاس** (باد.): ئەستێرەناس. ـــ ی: ئەستێرەناسی.

**ستێرین** (باک.): ئەستێرەیی.

**ستێفلۆک** (باک.): مشکەکوێرە.

**ستێلّ** (کە.): حەوز، کۆگای ئاویّ.

**ستێلە** (باک.): شایان، شیاو، وووریا.

**ستێوور** (شک.): ئەستێوور.

**ستی**: نێوی ژنانە.

**ستینک** (باد.): کۆڵەکە.

**ستینگ** (هەورا.): شەنکە سوورە، ژەنگەسوورە. (باک.) زەرگەتە.

**سج**: زج.

**سجاف**: پەراوێزی کەوا و چتی تر.

**سجافتەنگ**: دەست تەنگ.

**سجەمار**: جوورە مارێکە لە تیرە مار درێژترە، هەرکاتێ ڕقی هەستێ خۆی داوێ بەقەد گوریسێکی.

**سجل:** دادنامە، سکالآی گشتی.

**سجووق:** باسوخ، باستیک، جوورە شیرنیاتێکە لە دۆشاو و نیشاستە و بادامی دروستدەکرێ و درێژکۆڵەیە جارجاریش لە نیشاستە و شیلەی ترێی دروستدەکرێ و پڕە لە کاکڵەگوێز.

**سچ** (بابا.): (شا.) سژ، زچ، جوورە قرنوویەکی تەنک و ڕەشە بە ئاژاڵانەوە دەنووسێ.

**سحالە** (لو.): ئاردەبرنج.

**سخ:** سفت.

**سخان** (لو.، فە.): ئێسک.

**سخمە:** سوخمە، سیخمە.

**سخوڵمە** (کە.): سیخورمە، نقوورچک، لەتەنیشت یا لە بنهەنگڵدان بە مست.

**سخێف** (باک.): جنێو، جوێن.

**سدان** (باک.): سندانی ئاسنگەران.

**سر** (باک.): سروە، بای هێدی و ساردە. (ڕەوا.) کێوی.

**سڕ:** بە تەنها بەکارنابرێ: دەستەسڕ: دەست خاوێن و ووشک کەرەوە. (زا.) بای سارد. (خۆ.، هەو.) کەمەرە، ڕچ، ڕچاو، گۆنە، تەزیو، ڕچیاو، بێهەست بۆ ئەندامێک بەکاردەبرێ، کە لەبەر سەرما و سۆڵە بێ هەست بووبێ، چیو، بۆ مار و دووپشک و زەردەواڵەش بەکاردەبرێ، کە لەبەر سەرمان قەسری بێ. تەزیو، کاس، گێژ، بێ هۆش.

**سڕان:** ئەستڕان، پاک کرانەوە.

**سڕاندنەوە:** ئەستڕینەوە.

**سڕە** (کە.، دەر.): کەمەرە، (هەورا.) گەمرە، پەین و شیاکەیێکە بەسەریەکدا پەستراوبێ. (کە.، هەو.، بابا.) نۆبە، نۆرە، کایە.

**سڕەدەوە:** سڕوکاس.

**سڕەفتن:** سڕەوین، ئارام گرتن.

**سڕەمار:** قوڵەوەبیاب، مەشکەدۆ، ماری کتکی، ماری سڕ.

**سڕەمۆک:** پووچەڵ، قرپۆک، بۆ میوە بەکاردەبرێ. قۆرەی ووشکە لە زستانێدا لە جیاتی سماقی لە چێشتێ دەکرێ، هاڵە.

**سڕەوان:** حەسانەوە، سانەوە، ئارام و بێدەنگ و مات و ئاسوودە بوون و ئارام گرتن، ئۆقرەگرتن، سڕەوتن، سڕەوین، سڕەوگرتن. ـــ ەوە: حاوانەوە، داکاسان. ـــ دن: حەساندنەوە، ئارام پێگرتن، تێ سڕەواندن: نقوورچک لێدان. ـــ دنەوە: ئارام گرتنەوە.

**سڕەواندن:** سڕەواندن.

**سڕەوت:** ئارامی، ئاسوودەیی؛ نەخۆشەکە ئەمشەو ـــ ی نەبوو: واتە ئارامی نەبوو. ـــ کردن: هێدی و هێمن بوون، حەسانەوە. ـــ گرتن: سڕەوتن، حەسانەوە. ـــ ن: هەدادان، ئارام بوون، ئارام گرتن، سڕەوان، تەبتین، هێدی بوون، هەڵکردن، ڕۆتەفتان، ڕۆتفتان، ڕۆتەفتین، حەسانەوە، ڕاکەوەی.

**سڕەوین:** سڕەوان، سڕەوتن، ئارامگرتن.

**سڕبوون:** تەزین، قەسران، قەسرین، قەفلین، کەسیرەبوون. قرمان، قسرمان، لەگۆکەوتن. ـــ ەوە: قسرین.

**سڕبێنک** (باد.): (باک.) سربینۆک، قەراخی نوشتاوەوەی جل و بەرگ و ئیتر.

**سڕپات** (خۆ.): تڵتە.

**سڕپە:** قسەکردن بە ژێر لێوەوە بۆ ئەوەی، کە کەس گوێی لێ نەبێ، سڕپەسرپ، سرتە.

**سڕپەری** (باک.): جووان.

**سڕپە سرپ:** سرتەسرت، سرتەی یەک لە دووای یەکتری.

**سرت:** دۆڵ، دەرەی نێوانی دوو کێوان. (هەورا.) دروو، درک. ـــ ە: پسەپس، چرتە، فسکە، (هەو.) چپە، چرپە، چفە، (هەورا.، بابا.) سرکە، سریوە، پچە، سرپە. ـــ کردن: چرپاندن، چپاندن.

**سرتەسرت:** چفەچف، پسەپس، فسەفس، چپەچپ، فسکەفسکە، سرکەسرک، (بابا.) چرپەچرپ، (ڕۆژ.) پچەپچ، چرتەچرت، (هەو.) چپەچپ. ـــ کردن: پسەپسکردن، پسپساندن، بە نهێنی یەکتر دوواندن.

**سرتی:** دژواری، هیشکی.

**سرخیجە:** سووریژە، سۆرکە.

**سرد** (زا.): گیانداری سرک.

**سردی** (هەورا.): پەیژە، نێردیوان.

**سردین** (زا.): کەوتنە ناو قەف و گوڵی گەنم و جۆو دانەوێڵە.

**سرشت:** سرووشت. ـــ ی: سرووشتی.

**سرفتن:** سرەوتن.

**سرک:** گیانداریکە لێنی و ماڵی نەبووبێ. (کە.، جا.) سڵ، زیز، تۆراو. سڵەماوەوە، ماڵات یا ئاژاڵێکە لەترسان بسڵەمێتەوە.

**سرکاسن** (ئەردە.): ڕەنگێکی ڕەشە کەوشدروو لە سرکە و ئاسن دروستی دەکەن و چەرمی پێ ڕەشدەکەن.

**سرکاندن:** چرپاندن بە گوێی کەسێکیدا.

**سرکانن** (ئەردە.): سرکاندن.

**سرکە** (موک.): ئاڤاترش، سەهک، ئاوێکی زۆر ترشە لە میوە و چەند جوورە ترێیەک دروستدەکرێ یا کەشمولێ ترێ دخەن ئاڤترشی دەبێتە سرکە. (بابا.، هەورا.، کە.) سرتە، سرپە، چپە، ووتەی بێ دەنگ و هێواش. ڕوبی هنار، قاتۆلی، ڕوبەنار.

**سرکەسرک:** سرتەسرت، (ڕۆژ.) پچەپچ، سرپەسرپی زۆر، مقۆمقۆ، وورتە وورت.

**سرکەوان:** سەرگوێلک، سەرەنووێلک.

**سرکەی دەساڵە:** مەبەس لە ڕق و قینێکی کۆنە، کە لە دڵدا هەر مابێتەوە.

**سرکەیی:** هەوری، جوورە هەورییێکی گوڵداری ئافرەتانە لە ئاوریشمی دروستدەکرێت لە سەری دەبەستن، ڕەنگی وە سرکەی دەچی. ڕەنگی چتێکییە وە سرکەی دەچێ.

**سڕکردن:** قرماندن، بێهەست کردن، لە گۆ خستن، قەسراندن، تەفلاندن، تەزاندنی ئەندام بەسەرما یا بەدەرمان. ـــ ەوە: سەرهاووردن و بردن، ڕامان، بیرکردنەوە.

**سرگ:** سرت.

**سڕگوم:** سەرگوم، ئاوارە، دەربەدەر. ــ ی: ئاوارەیی، دەربەدەری.

**سرمە** (باک.): سوورمە، کل. سیرمە لە قەیتانی بە سیم و سیم چادەکەن. سرمەی زەرد و سپی هەیە.

**سرمەسرم:** غەڵبەغەڵبی دانیشتگایان، هەراو هوریا.

**سرمەکری** (باک.): سوورمەکراو.

**سرمک:** سلمۆکە، گیایەکە هێندێک بلند دەبێ و بە سوور کراوەوەیی دەخورێ.

**سرمۆکە** (سوور.، دزە.): قۆزەی ووشک کراوەوە بۆ چێشتی، سیرەمۆک، هاڵە.

**سرمیچ:** حەسیرو هەمژگ و هەژاڵێکە، کە لەسەر داری دارە ڕایە دادەنرێت.

**سڕن** (باک.): هێزی ڕاکێشان.

**سرنا:** زوڕنا.

**سرناتک:** زوڕناتک، گیایەکە.

**سرناژەن:** زوڕناژەن.

**سرناوەسار** (ئەردە.): چەقەنەی ئاشی.

**سرنج:** سەرنج.

**سرنگیا:** سەنیر، سەرین.

**سرواز:** ڕیتاڵە، شیاکەی تەڕ.

**سروان** (کە.): لەپڕاڵیدان، لە نەکاو تێسرواندن. ــ دن: ئارام کردن، پایەدارکردن. ــ ن: سرواندن.

**سروە:** سریوە، سر، سوور، هاتنی بایەکی سووک، شنە، شنەی بای، دەنگی بایەکی لەسەرەخۆیە. دەنگ و باسێکی تازەیە، سووسەکردن. دەنگێکی سووک و هەستێکی زۆر سووکی پێیان و چتی ترە، بای فێنک و هێواش.

**سڕۆک:** سەرمابردوو، بەسەرما قەڵس، سڕ، سڕبوو، دەست و پێ چوو، کەسێکە هەمیشە سەرمای بێ.

**سرۆندە** (باک.): سەربێنک.

**سرووج:** شارێکی گچکەی کوردستانییە لە ڕۆژاوای شاری ڕەها (ئورفە) یە دەشتەکەی ناوداره ئێلی بەرازی لێیە.

**سرووت** (هەورا.): پەڵخوڕ، پاش ئاخوڕ، (هەورا.) پاش ئاور، لاسکی گەنم و جۆ، کە نەکرابێتە کا.

**سروود:** گۆرانی نیشتمانی.

**سرووش:** فەرمانێکە بە هۆی فرشتەوە لە خوداوەبێ بۆ پێغەمبەران.

**سرووشت:** سرشت. (هەورا.) ــ ی: خۆڕسکی، سوورشتی.

**سرووم** (باک.): پۆپەی لاری کێوان. (باک.) بزنێکە گوێیە کانی لێک نزیک بن.

**سرێش** (کە.، هەورا.): چرێش، بنە گیایەکە دەکوترێ و بە ناو دەگیرێتەوە بۆ پێوە نووساندنی قاقەز و مقەوا و پەڕۆ و ئیتر. ئەسرێلک، ئەسترێلک.

**سرێشک:** (ڕەوا.) ئەسرێشک، کوپەوکوپەڵەیە لە چرێشی بەم جوورە دروستدەکرێ: توورە کەیێکی لە گڵ یا لە پشکل باش دەئاخنەوە و چرێشی گیراوەوەی لەدەوری هەڵدەسوون، کە بیانەوێ ئەستوور بێ چەند قاتی لەسەر یەکتری تێهەڵدەسوون، کە ووشک بووە ناوەڕۆکەکەی لێ ڕژدەکەن و توورەکەکەشی لێ دەردێنێ. ئەو کوپەڵەیە لە بابەت باشی و ڕەقی و قایی و سووکییەوە بێ هاوتایە، هەنگوین و ڕۆن و دوشاو دانەوێڵەی تێدەکرێ.

**سرێقلەمە:** کاری ناپوخت و جەڵغەمە.

**سڕی** (موک.، برا.): سەرا، ساردی. بێ هەستی، نە جوولانەوە و لەگۆ کەوتنی پەلی مرۆ و هەموو گیان لەبەرێکییە لە سەرمان یا لە بەر دەرمانی بێ هەستی.

**سڕی سەرما:** سەختی سەرما.

**سریشم** (ئەردە.): ــ ی ماسی: غرا.

**سڕین:** فم کردن، لووت خاوێنکردنەوە. ئەسترین، پاک کردنەوە، لابردن.

**سڕین** (باک.): چڕین. ــ ەوە: ئەسترینەوە، دووبارە سڕین، (دەر.) سڕاندنەوە، ئەسترینەوەی نووسراو.

**سرینجک** (ئەردە.): سنجوو.

**سرینجکەتاڵە** (ئەردە.): جوورە سنجوویێکە.

**سریوە:** سروەی بای، شنەی با. سرتە، چرپە، هەستە، سروە. جریوە.

**سریوەسریو:** دەنگی نزم و بێ تینی باڵندە و بێچووە باڵندانە لە شەوێدا. مشکیش ــ ی دێ.

**سزا** (هەورا.): تۆڵە، ئازار، دامان، دەردی سەری، جەزرەوە، سەرە سووری. ــ چەژتن: سزا خواردن. ــ خواردن: داغ و خەفەت چوونەدڵ. ــ دان: (هەورا.) سزادای، ئەشکەنجەکردن، ئازاردان. ــ دای (هەورا.): سزادان. ــ دەر: ئازار و ئەشکەنجەدەر. ــ وار: شایان، شیاو. ــ واری: شایانی، شیاوی.

**سزک** (جا.): (جا.) تاماو، دژی کولاوی پالێوراوە، کە شیرێژی لێ گیرا بە ناوەکەی دەڵێن سزک: ئاوی پەنیرییە، کە دەکرێ بە لۆرک.

**سزگ:** زەردارێکە لە ڕووی دژی ڕادەوەستێ. ــ او: ئاوی دژیەکییە شیرێژەکەی لێدەرهێنرابێ.

**سزیان** (زەن.، کەل.): سووتان.

**سژ:** زچ، (هەورا.) سچ، داعبایەکە لە قرنووی گچکەترە بە ماڵاتان وەردەبێ و لە پاشان دەبێتە مێشەسەگانە.

**سس** (فە.): سست، خاو، سووک، بێ هێز، هێواش.

**سسە** (ئەردە.): سستەک، فش، خاکی سست.

**سست:** خاوو خلیچک، خاولیچ، (باک.) برانگوە، بەرانگە، شل، خاو، نەرم، منۆخ، تەپ، تەنبەڵ، تەوەزەل، بێکارە، دەست و پێ سپی، لەسەرەخۆ، بەکارەخۆ، لەشگران، دەستاژۆ، بێ دەست و برد.

**سستەپەلە:** تەنبەڵ، خاولیچ، خاوخلیچک، خەمسار، خەمسارد، کەسێکە لە کاروباریدا سست و دەستە پارچەبێ.

**سستەک:** زەوی و خاکی فشەڵ، زەوییەکە خاکەکەی ڕزیو و فشۆڵبێ و بێ بەرد بێ، کە ناوی لێ نرێ لە بەری نەڕووا و هەمووی قووت بدات، زەوی را بە کاری کشتوکاڵ نایەت.

**سست بوون:** خاوبوون، تەیرین، نەمانی تەووژم و دەست و بردی. ــ ەوە: خاوبوونەوە، (کە.) سستەوەبوون.

**سسترۆ:** کەمرۆ.

**سمتکردن:** نەرمژاندن.

**سمتی:** تەنبەڵی، خاوی، تەمەڵی، تەوەزەلی، تنانەوە، کاسوولی، پەز، خلیچکی، فسەکی. ـــ کردن: خستنە پشت گـووێ، بـە جـێ هێشـتنی کارێکی بە قەستی یا لەبەر لەبیرچوون، خۆتێ نەگەیاندن، گووێ نەدان.

**سمۆش:** گێل، گێژ.

**سمێ** (باک. ، ژەن. ، سوور. ): سێ (۳).

**سەی:** سستی، تەنبەڵی، خاوی، سری، بێ هێزی، گەوجی. (باد. ) تۆوی کەنگرییە دووای جووتکردنەوە و برژاندنی.

**سەیارک** (باک. ): سیسارگە کەچەڵە.

**سەیانک** (باک. ): باڵندەییێکە.

**سغ:** سخ.

**سفر:** پێست و چەرمی گیان لەبەرانە، کە تەنک و خراپ بێ بەلەشییەوە.

**سف** (باک. ): هەر، تەنها، تەنیا.

**سفت:** (رەوا. ) بۆر، پرچنرانی پارچەیە، پارچەی توند چنراوە، کـە شاش نەبێ. (باک. ) گەند، خراو، خراپ، سادە: بـارام سفتی دینە: واتـە سادە دینە.

**سفتلح:** فرۆشتنی چتێکە یەکـەمجار سەر لەبەیانی، کـە شتفرۆشێک بـە پارەی دەستی بفرۆشێ.

**سفتە** (ئەردە. ): چاپلووسی، مرایی. (ژاوە. ) سووتاو، برژاو. (ئەردە. ) چتی سووراوەوەی لـووس و سووراوەوە. (ئەردە. ) قووری توند و پەیت. ـــ وبوون: سفت بوون.

**سفتەوکردن:** سفت کردن.

**سفت بوون** (ئەردە. ): سەخت بوونی چت.

**سفتک** (باک. ): جوورە ترێیەکە.

**سفتکردن:** پر و بۆر چنین.

**سفتۆ** (باک. ): سفت. (زا. ) چتی بۆگەن.

**سفت و سۆ:** ئێش و ئۆفی برینان، کفت و کۆ، سفت و سووێ. ـــ ت: کفت و کۆ.

**سفت و سۆڵ:** چتی زۆر سفت.

**سفت و سووێ:** ئازار و ئێشی برین و نەخۆشی؛ دەرمانەکە بە جارێکی ـــ ی ئازارەکەمی شکاند.

**سفتهۆنانەوە:** سفت هۆنینەوە.

**سفتی:** توند و بور و باش چنرانی پارچە.

**سفتیچک** (ئەردە. ): گیایەکی تەری شیرداره.

**سفرە:** (باک. ) پێدەکەر، خووان، کەوڵی نانی، سەخردان، سوفرە، چتێکە ڕاخرێت و نانی لەسەر بخورێت، پارچە تنراوێکە لە جیاتی مجۆعمە بۆ نان لەسەر دانانێ ڕادەخرێ.

**سفرەبرە:** جوورە قالۆچەییێکی ڕەشی خێرایە سفرەی کوندەکات ،

**سفرەچی:** کەسێکە بە سەر سفرە ڕابگا ، خوانچی.

**سفرە داچنیاگ:** سفرەی چنراوەوە.

**سفرەمار** (کۆ. ): کووێرەمار، جوورە مـارێکی کورتی کووێرە لۆچێـک لـە زگیدا، کـە برسی بـێ ئاوەڵـەی دەکاتـەوە مێـش و داعبـای لـێ دەنیشـێ پێکیەوە دەنێتەوە و دەیانخوا.

**سفرەماسی:** جوورە ماسییەکە.

**سفرەی چەرم:** سفرەیێکە لـە چەرمی خۆشکراو دروستەکرێ.

**سفرەی فـەقێیان** (ئـەردە. ): هەشـت ئەسـتێرەن، لـە نێوانـی ئەسـتێرەی دووپشک و تەرازوودایە. سفرەی هەتیوان، سفرەی دەروێشان.

**سفرنە** (باک. ): سفک، (موک. ) سووانده، لە کەنار بانان دروستەکرێ تا ئاو بە دیواریدا شۆڕ نەبێتەوە.

**سفری** (زا. ): بەردەستێی چەخماخی تفەنگی شینکە، کە درێژکۆڵە بێ.

**سـفـک** (بـاک. ): زۆربـڵـێ، چەنەسـووک، چەنـەباز، (بـاک. ) سـفرنە. سفینەک، سەر بالۆچکەیەکە لە سەر دەرک و پەنجەران دروست دەکرێ تا بارانەیان وێ نەکەوێ. (بابا. ) هەیوانی خانووی یەکنهۆم.

**سفکی:** سووکی.

**سفلیس:** کفتی، بۆیک.

**سفن:** دەستارێژ، بنچ و بناوانی هەموو چتێک، جوهر، مادە.

**سفی** (ئەردە. ): سپی، چەرمگ.

**سفیدە:** سپێدە.

**سـفۆری** (بـاک. ): سـنجاب، کەوڵێکیشـە لـە پێسـتی سـەگلاوی دروستکرابێ.

**سفیر**(ع. ): باڵیۆز، ئێلچی.

**سفەدە** (باک. ): سابات، کەپر. سەربانووچکە سەردەرک و پەنجەران. سەردەرگای خانوو، کە بەخشت بەرزدەکرێتەوە.

**سفەفک** (باک. ): باڵندەییێکە.

**سفەفیلک** (باک. ): جوورە چۆلەکەییێکی ڕەنگینە.

**سـفک** (باک. ): داردەست. (باک. ) سووک، ئاسان. ـــ بوون: سـووک بوون. ـــ کردن: سووک و ئاسانکردن. گورج، توندوتۆڵ. ـــ برۆ: بـە گورجی برۆ. ـــ اهی (باک. ): سووکێتی.

**سفکبار** (باک. ): سووکبار، بارسووک.

**سفکی** (باک. ): سووکی.

**سفنک** (باک. ): گەسک، گەسکێکە بـە پشتی گادا دەهێنرێ بۆ پـاک کردنەوە. ـــ کرن: گەسک لێدان.

**سفۆک** (باک. ، ژەن. ): سماق، ترش.

**سفووری** (باک. ): سمۆرە.

**سفی:** پـەردەی پێسـتی، سـەوەتەی پشـتی. (بـاد. ) کەپـەک، پـووش و پەلاشێکە لـە ساوار و برنـج و جـۆ و دەغـڵ و دانـی کوتـراو و بـەباکراودا دەمێنێتەوە. (باد. ) لەواشەیەکیشە بۆ سەگان لە کەپەکی دروستەکرێ.

**سفیان** (مام. ): سوورە ساقە، فەرخەیێکە هێشتا پەرو باڵی دەرنەکردبێ و لەشی هەر گۆشتی سوورو ڕووت بێ.

**سفیانک** (باک. ): چۆلەکە، پاساری.

**سفیشک** (باک. ): گومان، دوو دڵی لە چتێکا.

**سفیک** (باک. ): میچ، بنمیچ.

**سقینەک** (باک.): سابات، کەپر، سفک. سەربان و سەر پۆشی دەرەوەی پەنجەرە و دەرکانە بۆ پارازتنیان لە باران.

**سقان** (ئەردە.): ئێسقان، ئێسک.

**سقاو**: سەقاو، جوورە دەردێکی وولاخانە.

**سک** (بابا.، هەورا.): زگ، (هەورا.) لەمە، هوورگ، کەوک، ئەشقەمە. (باک.) ناشیرین، ناحەز، دزێو لە هەموو چتێک.

**سکاسن** (ئەردە.): سرکاسن، سرکەی ناسنی.

**سکاڵا**: گازندە، گازانده، گلەیی، دەردی دڵ، دەردی دەروون، داخ و خەفەت. گفت و گۆ، ووتوووێژ، ووتوو وێژ.

**سکاڵانامە**: نووسینێکە داواکاری یان سکاڵای تێدا نووسرابێ.*

**سکاڵا هەڵڕشتن**: دەردی دڵی خۆ گێڕانەوە.

**سکانن** (ئەردە.): چەسپاندن، جنێودان.

**سک ئێشە**: زگ ئێشە، ئازاری ناوزگ.

**سکە**: دراوی زێڕیا زیو و کانی ترە. ـــ لێدان: دراو دروستکردن. بزمار. (جەبا.) ئەو توورکە بە رووکاری دەرەوەی لێوی خوارەوەیە.

**سکەدەس**: سەگ دەست.

**سکەڕۆ** (کە.): زگەڕۆ، چاوبرسی، زگبرسی، سکدڕاو، زگدڕاو.

**سکەشۆرە**: زگەشۆرە.

**سکەف** (ئەردە.): سفک، سەربڕان.

**سکەڵ** (هەورا.): پۆلوو، سکڵ.

**سکەلێدان**: دراو دروستکردن.

**سکەنجەبین**: خۆشاوێکە لە سرکەو هەنگوینی دروستدەکرێ بە تایبەتی بۆ بەربەستکردنی نەخۆشی ڕشانەوە (تاعون) و کۆلێرە.

**سکەنجەمین**: سکەنجەبین.

**سکبەردان**: زگبەردان.

**سکپ** (ئەردە.): داری گرێژنەی دەرگا. (ئەردە) ئاستانە، بەردەرگانە.

**سکپڕ**: زگپڕ، ئاووس. ـــ بوون: زگپڕبوونی ئافرەت، ئاووسبوون.

**سکچێس** (باک.): پاڵوێنە، پارزەن.

**سکچوون**: زگچوون.

**سکدار**: زگدار، تۆڵدار، ئاووس. (کە.) چەکی ئەنباردار وەکوو قەسەلی کوردی. ـــ ی: تۆڵداری.

**سکدڕاو**: زگدڕاو، زگبرسی، گیان لەبەری زۆرخۆر.

**سکر** (کە.): دیواری جۆگە و قەراخ ئاوانە. (باک.) پێشگرتنی ئاوێکییە لە بەیانی ئاوەکە بۆ هەستانی بۆ شوێنێکی بەرز، بەرهەڵست.

**سکرۆیین** (کە.): زگچوون، ڕەوان بوون. فیراندن، فیرکاندن، سکچوون.

**سکزل**: زگزل.

**سک سووتان**: مەبەس لە مردنی منداڵە.

**سکف** (ئەردە.): سکپ.

**سک کردن**: زگ کردن.

**سکڵ** (جا.، هەورا.): پشکۆ، پۆلووی ئاوور.

**سکڵفوو**: جوورە یارییەکە پشکۆیەک ئاوور بە دەرزییەک و تاوێ دەزوو هەڵدەواسرێ بەبن میچی، چەند کەسێک لە دەورەی فووی لێدەکەن، هەریەکە بەرەو رووی ئەویتر.

**سکماک**: زگماک.

**سکن** (کە.): زگزل، وورگن، سکزل.

**سکنانەسەر**: زگ لەسەر دانان، مەبەس لە خواردنی چتێکییە بە هەڵمەت و ئیشتیا و ئارەزووەوە.

**سکور**: ملی گیاندار.

**سکورت**: ئەستۆ.

**سکورد**: سکور، ئەستۆ، مل، پژمل.

**سکوزا**: زاوزێ.

**سک و سەودا** (کە.): کەیف و ئاهەنگ.

**سکوور**: ئەستۆ.

**سگار**: سیغار، جگەرە.

**سکووم** (باک.): ڕوو، چارە، ڕوخسار.

**سگووم**(باک.): بەدخوو.

**سگین**: پێوەبوونی سەگی نێر و مێ.

**سل**: تەپکە، ساق، تەپ، تەپە پیسایی، تەنها بۆ ساقە گووی مرۆڤان و سەگ و ئیتریش بەکاردەبرێ، کە ئەستوور و درێژکۆڵەیە. (باک.) سڵ.

**سڵ** (باک.): تووڕە، زیز، تۆراو. سرک، ڕەم، چڵەکە، سڵەمە. تۆزن، تۆسن. ئەنگر.

**سلار**: تخێڵ، بەلادا.

**سلاربوونەوە**: کەوتن، منداربوون. مردن، پێڕاهاتن، بەلاداهاتن، تلۆر بوونەوە.

**سلارکردنەوە**: درێژکردن، مراندن، بەلاداهێنان.

**سلاڤ** (باد.): سەلام، ڕۆژباش.

**سلاڤ** (ع.): شەگگە، هەموو کاتێکتان باش.

**سلامانە** (ئەردە.): دیاری.

**سڵاو**: ڕۆژباش، هەموو کات باش. ئەو پارچە بەرد یا چتەیە، کە دەخرێتە سەر ئەو چتەی، کە بە تەرازوو دەکێشرێ تا لە سەنگەکە قورستربێ.

**سڵاودانەوە**: چت یا بەردێک لەنێو تەرازوونان تا دابێ، ئەو لنگە تەرازووەی، کە چتی فرۆشیاری تێدەکرێ، کە دابێ دەڵێن سڵاوی داوە، بەڵان کە دانەیەت دەڵێن سڵاوی نەداوەتەوە.

**سلە** (باک.): زللە، شەقەزللە، دبێژن مەن بدەستی خوە شەقامەک لە ڕووی فەرهاد خست.

**سلەزەوە** (هەورا.): باپشکێو.

**سڵەمانەوە** (کە.): سڵەمینەوە، ترسان، ڕەوینەوە.

**سڵەماندنەوە**: ترساندن، بە ترساندن کشاندنە دوواوە، ڕەواندنەوە.

**سڵەمە** (د.): بسڵمینەوە، ڕەم، گوریز، چڵەکە.

**سڵەمیانەوە** (ئەردە.): سڵەمینەوە، چڵەکیانەوە.

**سڵەمینەوە:** سڵەمانەوە، (کە.) هەڵسڵەمانەوە، کەوتنە تەلاسکە، کوتوپڕ پاشەوپاش گەڕانەوە، ترسان، خۆکێشانەوە بۆ دواوە لە ترسان. بۆ هەموو گیان لەبەرێک بەکاردەبرێ بەتایبەتی بۆ وولاخ و ئاژاڵ و نێچیران .

**سڵەوەچە:** جوورە نەخۆشییەکە لە ئاژاڵان دەدات، خواردنیان بۆ قووت نادرێت، دەچێتە ناو گووپ و دەدانیەوە.

**سڵەوەجێ:** جوورە نەخۆشییێکە لە مەڕ و بزنان دەدات، کیسەیەک لەژێر مل ولاچەنەگەی پەیدادەبێت هەرچییێکی بیخوات دەچێتە ناو کیسەکەوە و ناچێتە ناو زگییەوە. سلەوەجە.

**سڵ بوون:** کەوتنە تەلاسکە، سلکینی، مانگرتن، تۆران، زیزبوون، غەیدین، خەیدین. مانگرتن.

**سلپ** (ئەردە.): مرۆڤی تەنبەڵ، پڵپ، تەژاڵ، تەمەڵ.

**سلپات:** (خۆ.) سرپات. ترێ و یا تەماتەیەکە لە دوای کوشرانیان بە تڵتەکەی دەڵێن. تفر و تڵتەی چتی کوشراوە.

**سلپەک** (زەن.): تڵتە.

**سڵتان** (ڕەوا.): نێوی قوونی مرۆیە، کۆم، کۆمی.

**سڵتانسەر** (ئەردە.): تۆقسەری مرۆڤانە.

**سلسات** (باک.): کۆمەڵە، ئەنجومەن.

**سلساردبوونەوە:** مەبەس لە مردنە.

**سڵساردکردنەوە:** مەبەس لە کوژتنە.

**سلسەردەوەبوون:** سا ساردبونەوە.

**سلسلە:** زنجیر، زرێ.

**سڵسڵە:** پۆیلە و پڵپڵەیێکی ژنانە لە خۆیانیان دەدەن.

**سلسلک** (باک.): تەرزەی سووک.

**سڵف** (ئەردە.): تڵپەی چت.

**سڵق:** زلق، گیایەکی گەڵاپانی بنکدارە، دەکرێ بە چێشت.

**سڵقاو:** کەسکاو، شۆرباوێکە لە ئاو و سڵق و گۆشت دروست دەکرێ.

**سڵقی رووت:** بۆ مرۆی بێکەس بەکاردەبرێ، دەڵێن سمکۆ وەکوو سلقی روت وایە واتە: بێکەسە.

**سلک** (زا.): سڵق. (باک.) چەوەندەر.

**سلکەسپی:** چەوەندەری سپی.

**سلکەسۆر:** چەوەندەری سوور.

**سڵکردن:** تەپە گوویەک کردن. سڵەمینەوە.

**سلکین** (باک.): سڵ بوون، تۆران.

**سڵمکە:** سڵمۆکە.

**سڵمۆکە:** سمرکە، سمبرکە، سرمک، (ڕەوا.) بەرییێنە، سەڵمکە، سلمکە، کە لەگەڵ نیسک یا ساواری لێنرێ بۆ ڕاگرتنی زگچوونی زۆرباشە.

**سلۆپی** (باک.): شیرنیات سازی.

**سلۆرت** (کە.): بێ کارە، دەست بەتاڵ. بێ دەمار، حیز، خاو.

**سلێڤا:** نێلێکی کوردە و ناودارە ل هێلا باژارێ فارقین دکەڤێ.

**سلیڤانە:** هۆزێکی کوردە لە بادیناندا.

**سلێمانی:** مووررووی سلێمانی، جوورە موورروویەکی ڕەشی پانە دێغێکی سپی لەناوەڕاستیدایە، ژنان لە زێڕی دەگرن و لە ملیان دەکەن. ناوی جوورە ترێیەکییە. جوورە بەردێکی ناسراوە ژنان دەیکەنە گەردنبەند. دەرمانێکە. شارێکە لە خاکی شارەزووردا، کە پایتەختی پادشایەکانی بەبەی بووە.

**سلیک** (فە.): درەو، درک.

**سم:** سمووچک، سمووچکە، پاقولاخ، (باد.) چم، سمی مالاّت و وولاّخان و ئاژالاّنە، چتێکی ڕەش و ڕەقە بەژێر چوارپەلی ئاژاڵ و وولاّخی بەرزەوە وەکوو نینۆکی مرۆڤان، یەکسم و دووسم. بەپێی دووسمانیش هەردەڵێن ـــ.

**سماتە:** جوورە بەردێکی زۆر ڕەقە. سمارتە.

**سمارتە:** سمپارتە، سمپارە، قاقەزێکی زبرە وەکوو برپەند ئاسن و دار و گەلێ چتی تری پێ دەکرێژی و لووس دەکرێ.

**سماق:** سۆک، ترش، داری ترش، توتم، توتوم.

**سماقە** (ئەردە.): ڕەوونج.

**سماق پارزن** (بۆتا.): شێرپالۆک.

**سماق پالاّن** (باک.): پالووێنەیەکە برنجی پێ دەپاڵێورێ.

**سماق دەرهێنان** : مەبەس لە ئازاردانی زۆرە بە یەکێک.

**سمایل:** ناوی نێرینانە، بچووکراوەی ئیسماعیلە.

**سمایلۆک** (ڕەوا.): جوورە دانەوێڵەیەکە لە پیرخەنی ووردتر و لە ئاردی ساواری درشتترە، هەر چێشتێکی بەوی لێنرێ هەر ـــ ی پێدەڵێن، پیرخەنی، پیرخەنیلە.

**سمە:** سمۆ.

**سمەخرتە** (ئەردە.): گیان لەبەرێکی دەست و پێ کورتە.

**سمەر** (هەکا.): کا.

**سمەری** (هەورا.): کا، کای کۆن.

**سمەسا:** مەلەما، ـــ ی برین: مەلەمای برین.

**سمەشەڵە** (ئەردە.): سەلکە، نەخۆشی سمی ئاژالاّنە.

**سمەڤیالان** (باک.): هێڵەگی مس.

**سمەکوتێ:** سم کوتێ، سمکۆلاّن.

**سمەوازی** (ڕەوا.): سلی، ـــ بوون: سڵەمینەوە.

**سمەوەج** (موک.): جوورە گەغێکە.

**سمبر** (زا.): سم تراش.

**سمبرکە** (خۆ.): سڵمۆکە.

**سمبۆرە:** سمۆرە.

**سمبێل** (باک.): سمێڵ. (دهۆ.) سمێڵ.

**سمبیلەک** (باک.): جوورە ماسییەکی زەردە.

**سمپارە:** سمارتە، سمپارتە، قاقەزی پەرداخ، قاقەزی زمپارە، کاغەزێکی زبر و درە، ئەوەی کەمێک زبرە داری پێ لووس دەکەن و ئەوەی، کە زۆر زبرە بۆ لووس کردن و خاوێن کردنەوەی کانی ژەنگاوی بەکاردەبرێ.

**سمپارتە:** سمپارە.

**سمپووتی:** سمکوڵۆڵی، (هەورا.) سمپەرژڵی.

**سمت:** کەفەڵ، قاڵچە. کولۆت، کەماخ، تەراف، لاتەراف، سورین، تەرماقوون، دوو گولمی گەورەیە گۆشتییە، کە لەلای ڕاست وچەپی گیاندارەوەیە. (باک.) قوللە و سەرتەپۆلکەی کێوان. (باک.) پەلاوی ساوارێ یا گەفە کوتاوێ.

**سمتاش:** سمتەراش، سمتراش.

**سمتاندن:** کونکردن، سمین، (بسمەتینە).

**سمتانن:** سمتاندن.

**سمتەجوڵە:** قووندان.

**سمتەجووڵە** (کە.): ئێسقانی جەمسەری هەردوولا سمتی گیاندارە.

**سمتەر:** کونکەر.

**سمتەراش:** سمتراش، ئاسنێکی پانی تیژە ناڵبەندان سمی وولاخی پێ دەتاشن.

**سمتەک** (هەو.): سمتک، مرازێکە لە کەرەستەی جووتی.

**سمتەگڵ:** گڵمەت، سندەگڵ، (هەو.) کستەک.

**سمتراش:** مرازێکە ناڵبەندان سمی وولاخانی پێ دەتاشن، ئاسنێکی دم پانی کلک درێژی دەستەدارینە ناڵبەندان سمی وولاخی پێدەتاشن وەکوو نینۆک کردن.

**سمتراشی:** سمتاشین.

**سمتک:** سمتەک، مرازێکی تەونییە، دوو داری دوولکە بۆ تەونی دەچەقێنرێ و تەونی پێوە هەڵدەواسرێ.

**سمتمت** (باک.): سمتەک.

**سمتن:** سمین، کونکردن.

**سمت و ساتان:** سمت و نەرمایی هەردووک ڕانە لە پشتەوە دەردەکەوێ.

**سمتول** (ئەردە.): سمت، کەفەڵ، لاتەراف.

**سمتی:** سمراو.

**سمتیکۆر** (باک.): ڕێگایەکە بە بن چیا و ژێر زەوی کونکراودا تێپەڕێ. تونێل.

**سمتین:** کونکران، کونبوون.

**سمدار:** مەبەس لە گیاندارێکییە، کە سمی هەبێ.

**سمدم:** سندم، پێوەند. ـــ کردن: سندم کردن.

**سمڕ:** هەراوهۆریا و دەنگەدەنگ، لە فیسارە شوێنی ـــ بوو.

**سمڕاخە** (ئەردە.): چڵکی گرێچکە.

**سمڕان:** کونکران.

**سمڕاو:** سمتاو، سماو، سمتی.

**سمڕسمڕ:** هەراوهۆریای زۆر. کێشەکێش، گرمەگرمی شەڕوشۆڕی چەند کەسێکییە. بۆ تێکهەڵاوێژتنی وولاخ و ماڵاتانیش بەکاردەبرێت.

**سمڕکە:** سڵمکە، سڵمۆکە.

**سمڕێزای** (هەورا.): (هەورا.) سمگەنای، سمڕزین، سم بۆگەن بوون.

**سمسار** (ئەردە.): دەستفرۆش، ووردەواڵەفرۆش.

**سمساڵ** (کە.): گیایەکی بۆن ناخۆشە.

**سمسیارک** (کە.): سیسارگە کەچەڵە.

**سمقە:** (کە.) سمکە، مەرەزەیێکە بەبێ کێڵاڵ و گۆل بڕین بکرێت.

**سمقەڵێشیای** (هەورا.): سم قەڵشان.

**سمکاک** (زا.): دەنکی گیایەکی سوورە دەکرێتە دەرمان.

**سمکە** (کە.): جوورە مەرەزەیێکە بە پانی بهێڵرێتەوە و ئاوی بەسەردا بەربدرێ و نەکرێتە گۆل.

**سمکەر** (باک.): کونکەر، مراز و مرۆڤێکە چتی کون بکات.

**سمکۆ** (هەورا.): هەڵخلیسکان. (ئەردە.) سمکۆل. نێوی پیاوانە کورتکراوەی سمۆ، سمایل، ئیسماعیلییە.

**سمکۆت:** کەوچکی ماستاوی گچکەیە.

**سمکۆر:** (خۆ.) تەرپیشە، (ڕەوا.) تەرپیش، بنی دار و گوڵ و بڕکان دانەوە و هەڵکۆڵین تا پتر فراژی بێ و پشوویدەن و ئاویش باش بخۆنەوە.

**سمکۆڵ:** پێکۆڵ، (ڕۆژ.) پاکۆڵ، (شەم.) چەنگ کۆل، چەپۆکانی چارەوێیە، سمەکوتێ، دەست بەزەوی دادانی وولاخی بەرزەیە و هەڵکۆڵینی. ـــ کردن: زەوی بە سمان هەڵدڕین. ـــ کردن: دادای شەڕوکێشەکردن.

**سمکۆڵان:** سمکۆڵ.

**سمڵ:** گەردەنبەندی کچانە لە مێخەک و چتی تری دروستدەکەن، سۆتکە، سملە، سونبول، بنی گیایەکی کوێستانییە و بۆنی خۆشە و ڕەش بەقەد دەنکە خورماییێکی دەبێ، کە پاک کرا سپییە درێژکارە و بۆنی زۆرخۆشە و بەکاری گەلێک جوورە دەرمانان دێت.

**سمڵە:** گیایەکە لەناو دێراوی تووتنێدا پەیدا دەبێ مێمڵە بۆ تووتن.

**سمڵمڵ** (باک.): جوورە چۆلەکەیەکە، سێروو.

**سمنت:** چیمەنتۆ.

**سمنج** (ئەردە.): چرووک، چەق، گیر، ڕکن.

**سمۆ:** قەڵەمێکی پۆڵاییینە ئاسنی پێ کوندەکرێ، لوولە ئاسنێکی پۆڵاییینە و کونداره چتی پێ کوندەکرێت، زمە.

**سمۆرە:** سمبۆرە، سەڤۆری، دەعبایەکی کێوی چنگ تیژە لە کلک و گووێ و قوتیدا وە ڕێوی دەچێ، بەڵام لە بچووکیدا بەقەد بێچووە پشیلەیەکییە و هەر بەداران هەڵدەگەڕێ.

**سمۆرچکە:** سمی ئاژاڵی وورده، کە دەرهاتبێ.

**سمووچک:** سمۆرچکە.

**سمووچکە:** سمی ئاژاڵی ووردەیە، دووسمەیە.

**سمووره** (هەورا.): سمۆرە.

**سمووشتر:** پێی ووشتری.

**سمووڤی:** هۆزێکی کوردە لە بۆتانێدان.

**سمهۆرامای** (هەور ا.): سمداهاتن.

**سمێرپان:** زل بوون، زەلام بوون، تێسمێرپان.

**سمێڵ:** سمیل، سمبێل.

**سمێڵ تاشین:** سمبیل تراشین.

**سمێڵ گرتن:** بەرسمێل کردن.

**سمسیارک** (زا.): سیسارک.

**سمیتک** (بابا.): پیرخەنیلە.

**سمێریان** (ئەردە.): تێکسرمان، تێکسمران و قەڵەوبوون.

**سمێڵ**: (فە.) سیوول، سیوەل. (شوا.) سوورێڵ. (دەۆ.) سمبێل. سمبڵ، تووکی سەر لێوی سەرەوەی پیاوانە. خەتی سمێڵدان، خەتدان، بەرکەپرەشبوون. ـــ بابڕ: مرۆی سمێڵ زل.

**سمێڵە**: جوورە ماسیەکی سمێل دارە.

**سمیتک** (باد.): وورده ساوار، پیرخەنیلە.

**سمین**: کونکردن بە هۆی پاڵپێوەنانەوە یان بە هۆی هەر مرازێکی بێ، سمتاندن، سمتن، سمتین.

**سمییڵ**: سمێڵ.

**سن**: (باد.) سنک، (زمن.، هەورا.) سوون، باڵندەییێکە بە قەد مێشێکی بۆرە پشت قۆقز و بۆن ناخۆش و پیسە و هەر بە گەفێکی بدات لە کەڵکی دەخات، هەر سێبەریشی بکەوێتە سەر هەر دەغڵێکی لە ناوی دەبا لە تەرەتوو بدات لە بەر بۆن پیسی ناخورێ بە جارێکی مێملی گەنم و تەرەتوویە، باڵندەیێکی زۆر گچکەیە بە سەر هەر دەغڵ و دانێکیدا بفڕی بێ هێزی دەکات، کە دەغڵ و دان ڕەق بێ دەڵێن میزی پێدا دەکات و نەرم دەبێ و دەڕزێ. (باک.) نووکی تەختە بەردییە. (باک.) جودا، جیاواز. ـــ بوون: جودا بوون. ـــ کردن: جوداکردن.

**سنان** (ئەردە.): سندان، دەردێکە لە هەموو جوورە میوەییێکی دەدات بە زۆری لە تریزوو سێوو کاڵەکی دەدا، وەکوو مێخەکەیە لە ئەندامی ئینساندا.

**سنە**: شارێکی گەورەی کوردانە لە مەو پێش پایتەختی پادشایەکانی ئەردەڵانی بوو، ئەمڕۆ لە ژێردەستی عەجەماندایە ئیستگەی ڕادیۆیان بۆ دامەزراندوون گۆرانی، وتار چیرۆک لە هەموو لایەنێک دەدووێ ئەوە نەبی، کە کورد نەک هەردیلە بەڵکوو بە زمانی دایکو باوکی خۆیانی ناخوێنن و ناشنووسن.

**سنەوبەر**: درەختێکی تۆیی گەڵاووردی باڵابەرزی هەمیشە سەوزو جوان و تۆیە.

**سنەیی**: جوورە ترێیەکە، کە لە پێش ترێی زوورەسدا پێدەگات. دانیشتووی شارو هەرێمی سنەی.

**سنهنک** (زا.): گیایەکی بۆنخۆشە تێکەڵی پەنیری دەکرێ.

**سنتر**: منداڵی هەتیوی بێکەس. (باک.) گۆشەگیر، بەجێ هێڵ، کەسێکە خۆی لە هەموو چتێکی دوورخاتەوە.

**سنج** (باک.): سەنج، سنجی، سنجوو.

**سنجاب**: سنجاو.

**سنجابی**: خێڵێکی کوردە لە کوێستانێدا.

**سنجارخ**: سنجاق، دەرزیلەی سەرخڕ، چەتیان.

**سنجاف**: پەراوێزی کەواو چتی تر.

**سنجاق**: جوورە خشڵێکی ژنانە، دەرزیلەی سەر خڕ و پرپرەدار لە زێڕ یا لە زێو لە جیاتی دوگمە ئێخەی پێ قایم دەکرێت. پارچە زێڕێکی نقێم کارە بە دەزوو لە سەروپێچ قایم دەکرێ، سنجاقوورە. (یەز.) وێنە و نیگاری شەیتانییە.

**سنجاقوورە**: سنجاقی ژنانەیە، گیایەکیشە هەروە سنجاقی دەچێ.

**سنجاو**: سنجاب.

**سنجە**: (هەورا.) سنجەی، سنجوو، سرنیجک.

**سنجەق**: سنجاق.

**سنجەی** (هەورا.): عەنناب.

**سنجرەندن** (زا.): تەندوور داخستن.

**سنجک** (باک.): دەفرێکی درێژکۆڵەیە لە قوڕ دروستدەکرێ لە ژێر بێشکەی منداڵاندا دەخرێ تا میزو پیسایی بچێتە ناوییەوە.

**سنجۆق** (زا.): ڕیخۆڵەی گەورەی گیاندار.

**سنجوو**: لاس، (ڕەوا.، خۆ.، باک.) سنجی، دارە ـــ: دارێکە گەڵای وەکوو بی وایە بەرێکی شیرینی هەیە وەکوو خورمایە بەڵام گچکەترە.

**سنجووق** (هەو.، هەورا.): هەلووک، داردەستێکە بە قەد گەزێکییە لە گەمەی سنجووقانێدا بە کاردەبرێ.

**سنجووقانێ**: گەمەیەکە: هەلووکێن، دارێکی تیژی سەردادراوە، منداڵان بە زەویدا دای دەکوتن لە یاری سنجووقێنێدا.

**سنجووقێن**: گەمەکردن بە سنجووق.

**سنجێری** (باک.): جوورە ترێیەکی شیرینە.

**سنجی** (ڕەوا.، باک.): سنجوو. (زا.) دارێکە دەنکێکی مەزر دێنێ.

**سنجیە** (موک.): تووزم، خوو، ڕەفتار، پیشە، ڕەووشت.

**سندان**: (شا.) سارده، ساردەدەرد، قوزەڵقورت، ژەهری مار، کندرووس، زلفنج، زلفنجاو، لەسنگدان، دەردێکە لە نێو زگدا خڕ دەبێتەوە و کوژندەیە. بۆ جنێویش بەکار دەبرێ. مێخ سندان، ئاسنێکی گەورە و سەرپانە ئاسنگەران ئاسنی لەسەر دەکوتن. زنان، زندان، نەخۆشییێکە لە کاڵەک و شووتی و ترۆزی بدا ڕەقی دەکات.

**سنداناوی**: سنگاناوی، تەرەکاری و میوەیەکی سندان لێدراوە.

**سندانک**: کووپەڵە.

**سندان لێدراو**: سنگان لێدراو، سنداناوی، میوەییێکە سندان لێی دابێ.

**سندە**: گڵمەت، سندەگڵ، گڵمتک. ـــ گڵ: سندە، کلۆسن، پەل، (هەو.) کستەک، (شا.) خرجان، گڵمەت.

**سندف** (باک.): سندم.

**سنک** (زا.): پیر خەنیلە.

**سندم**: (ڕەوا.) سمدم، کۆت، (جا.، ڕۆژ.) پاوەن، (باک.) سندف، (هەورا.) پێوەند، مەربەن، مەربەند. پێوەی ئاسن. ـــ کردن: پێوەندکردن.

**سندۆڵ** (شا.، کۆ.): جۆنی، بەردێکی پانی نێو قووڵە برنجی تێدا دەکوترێ. ـــ ە (شا.) کووروورژم. ـــ کردن: کووروورژم هەڵاتن لە سەرنان بۆ کەروێشک بە کاردەبرێ.

**سندووق**: قوتووی ئامراز، گرامافۆن. ـــ ئاواز: گرامافۆن.

**سندی**: ناوی هۆزێکی کوردە لە بادیناندا.

**سندیان** (باک.): سنجیە، سندانی ئاسنگەران.

**سنصل** (باک.): بڕبڕەی پشتی، کاریتەی پشتی.

**سنک** (جا.): جەڵە، سمەمنۆک، قاییش یا پەتێکە بخرێتە ملی سەگ یا تاجی، دارێکی درێژە و پەتێکی لە سەرێکی گرێدراوە و سەرەکەی

تریشی لە ملی تاجی کراوە و سەرەکەی تری دارەکەش بە دەست دەگیرێ بۆ گوازتنەوەی سەگەکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. (جا.) ڕستەی ملی تاجیانە. (باد.) سن، هی دەغلان. ـ کردن: جەلەکردن، ڕستکردنی تاجی، سەمەندۆک. ـ کردن: سەمەندۆک کردن.

**سنگ**: کرمی ناوزگ. (هەورا.) سینە، داو، سینگ. ـ کوتان: تووک لە کەسێکی کردن، پێهەڵکاڵان. (ئەردە.) سووژن. سینگی دار یا ئاسن: هۆرە، سەمەندۆڵ. ـ ئاسن: گوڵمیخ، (باک.) سنگک، دار یا ئاسنێکی سەر تیژە لە دیوار یا بە زەویدا دادەکوترێ، پانایی نێوانی هەردوو مەمک و خوارتر چۆڵەمەی مل. (باک.) خەتی کار، پۆپەی کەڵەبابی. کرمی گەدە.

**سنگان**: سندان.

**سنگاناوی**: سندان لێدراو، سنداناوی.

**سنگان لێدراو**: سندان لێدراو.*

**سنگ ئێشە**: (هەورا.) سینە ئێشە، گیای سیاوەشان (قەیتەران) لە ناویدا شەو ڕۆژێک بخووسێ و بخورێتەوە بۆ زگ ئێشە باشە، ئاوی گەڵاَ بیش بۆ سنگ ئێشە زۆر باشە.

**سنگەسنگ** (ئەردە.): نیخەنیخ، خۆ خلافاندن بە چتێکەوە، هێدی هێدی.

**سنگەڵ** (هەورا.): سنگی کێوان.

**سنگەوباز**: سنگەوبازد.

**سنگەوبازد**: هەڵچوون بە سەر یەکێکیدا، کە لە گەمەی کەوشەکێندا تێکەوتبێ.

**سنگدانەپێشەوە**: دڕدانە بە مرۆڤان و چوونە پێشەوە بۆ چتێک.

**سنگر**: سەنگەر.

**سنگڕێژ** (بار.): شوێنی سنگان لە زەوی. ـ کردن: بە نووکی سنگان زەوی دێخ دێخ کردن.

**سنگزەردە**: باڵندەیێکی گچکەی ژێر زگ زەردە سەر پشتی ڕەنگاو ڕەنگە بەقەد چۆلوکەیەکییە، زۆرتر لەکاتی جۆ دروونێدا دەبینرێ.

**سنگژار** (باک.): دەردەباریکەدار، سیلدار. (باک.) ـــ ی: دەردەباریکە.

**سنگک** (زا.): زیپکە. سنگ.

**سنگ کوتان**: کوتانی سینگ و گوڵمیخ و ئیتر. لەسنگ دان، تووک کردن، پێهەڵکاڵان، لە داخان لە سینگ دان.

**سنگ لێکوتان**: تووک لێ کردن، پێهەڵکاڵان، لە سینگی خۆ دان لەگەڵ نزا کردن لە یەکێک.

**سنگ لێ نیان**: ڕێزگرتن.

**سنگنقیس** (باک.): حەمایەڵ، حەماییل.

**سنگۆ** (باد.): نێزە، دیارە کوردییێکی پەتییە چوونکوو زۆرتر لە سنگدەدرێ.

**سنگولە** (باک.): جووانەگای دووساڵانەیە.

**سننان** (بابا.): سندان.

**سنگهەڵکێش**: بریتییە لە مەردومی بێشەرم و نالەبار، هەندێ چارەوێشە بەقاپ و گاز سنگی هەڵدەکێشێ. ـــ ان: سینگ دەرپەڕاندن و خۆهەڵکێشان. سنگ لەزەوی دەرهێنان.

**سنوور**: سەرحەد، ئاقار، جەسپەر، چیلە، ناوان، شوورە. ڕادە، کەرخ، تخووب، تخوویب، قەمتەرە، بەنک، زەریب، هۆم، کەنار و قەراخی شوێنێکییە، کە لە شوێنێکی تری جووێ بکاتەوە. ـــ چە: سەرەتای گەڵادەرکردنی داروبارو گژو گیایانە. ـــ دار: چتێکە سنووری ببێ.

**سنووری مەیانەیی**: سنووری نێوەنجی.

**سنووری نێوونجی**: جەسپەری مەیانەیی.

**سنووق**: سندووق، چەکمەزە.

**سنی**: سوننی.

**سنێ** (باک.): قەمتەر. ـ کردن: قەمتەرکردن ئازاری نەگەیەنێتە برینی لەشی خۆی.

**سنێنەک** (باک.): گیایەکە.

**سنیان** (ئەردە.): کڕان.

**سینتر** (زا.): چتێکە وەکوو قیرِی وایە هەنگ لەبەردەمی پلوورەکەیدا دایدەنێ.

**سنێرکەش**: پەیینکێش.

**سۆ** (موک.): گیایە لەناو شیرێژی دەکرێ و بۆنی خۆشە. (موک.) ژان، ئێش، عەبدوڵڵا ڕەحیمی بەکاری بردووە:

ڕەحیمی هەژار عاشقی تۆیە
زامی خەتەرو ئێگجار بەسۆیە

نووکی دەرزی، دڕوو. (شا.، بابا.) کەپەکی ئاردی. دێق، (ع.) دق. (هەو.) لوو، تشپۆ، تشپۆک، لوویەکی دەرپەڕیوە لە بن پێستی گیان لە بەراندا بێ ئێشەو دەریش نابێ زۆرتر لە بن گەرووی ماڵاتان دەردەکەوێ، کە چاکیش ببێتەوە هەر هەڵدەداتەوە. (مو.) بینایی، هێزی بینایی. سبەینێ، سۆزی، سبێ. بنە، لە، وەچە، ڕەچەڵەک، ـــ شیان هەر برەوئازایە. کونی دەرزی. خۆ.

**سۆبا** (باک.): مەلەوان. ـ یی (باک.): مەلەوانی. ـ کرن: مەلەکردن.

**سۆبە** (گەرمێن.): کوورە، سۆپا.

**سۆبەبەر** (باک.): مەلەوان.

سۆبەبەر

**سۆبەری** (باک.): مەلە.

**سۆبلەتی** (دزە.): (خۆ.) سۆربلەتی، دارێکی بەراو و دێمەکاریشە دارو گەڵایەکەشی وەهی دارەگێوژی دەچێ بەڵام سوورترە دارەکەی دڕاوییە و بەرێکی خڕەگرێ وناخورێ ووردە وەکوو گێوژی وایە بەرەکەی بەدەم بارانەوە پێدەگات.

**سۆپا**: سۆبە، کوورەیێکی لوولەداری لەوح یا تەنەکەیە زستانان لە ژوورێدا ئاوری تێدادەکرێتەوە، بوخاری فەرەنگی.

**سۆپە** (باک.): سۆبە، کوورە، سۆپا.

**سۆت**: فیتفیتە، فیکفیکە. ـــ ە (باک.): بێ ئایین، بێ باوەڕی، داوێن پیس.

سۆت

**سۆتەک**: تۆزو پریشکی ئاورییە، کە بەرزدەبێتەوە. سووتووی جغارە.

**سۆتەکی داری** (ڕەوا.): خۆڵەمێش.

**سۆتەمەڕوو** (بابا.): ئەودارانەیە، کەلەپاش سووتانی جەنگەڵێکی مابێتەوە.

**سۆتەمەنی**: سووتەمەنی.

**سۆتەن**: سوتەمەنی. ـــ ی: سووتەمەنی.

**سۆتەی** (هەورا.): سووتان.

**سۆتک** (باک.): سەلکەبزووت، سەرەبزووک. سووتک. ـــ ە (هەو.، سوور.): ڕەبناک، (جا.، کە.) سملّ، چتێکە وەکوو دەنکی میوژی ڕەش وایەلەدەم جۆگەوزەناواندا لە ژێرخۆڵــی دەهێننــەدەرێ بەورشکی بۆنــی خۆشە ئافرەتان بۆ بۆنخۆشی وەکومێخەکی بەخۆیانی دادەکەن، بۆزگ ئێشە و دەردی چیکڵدانە بە کوتراوی دەخورێ. سۆتکەدێیەکە لە هەرێمی سەرچنار.

**سۆتمانی** (باک.): سووتەمەنی.

**سۆتن** (باک.): سووتان.

**سۆچنای** (هەورا.): سووتاندن.

**سۆچیای** (هەورا.): سووتان.

**سۆح**: سبەینێ بەیانی. ـــ ا: سبەینێ بەیانی زوو.

**سۆخت**: سووتەنی، سووتەمەنی. (ئەردە.) ـــ ە: سووختە، تریــاکی سووتاولەناو حوقەکەیدا مابێتەوە.

**سوخرە**: بێگار، سوغرە.

**سوخرەپێکردن**: سوغرە و بێگاری پێکردن.

**سۆخۆر** (ئەردە.): سوودخۆر.

**سۆر** (هەو.): سوور، (ڕەنگ). سوێر.

**سۆرابەردامەما** (هەو.): گەمەیێکی کوردییە.

**سۆراخ**: (باد.) سالۆخی، پەیغام، هەواڵ. سەردەم، سەرەوەخت، تەڵێۆ. سۆراغ، نونک، بنە، دینا، گومان. ـــ کردن: هەوا لّێرسین، وێکەوتن، سۆراغکردن.

**سۆراغ**: ســۆراخ. ـــ کــردن: سووســەکردن، شــوێن هــەڵگرتن، بەڵگەدۆزینەوەی چت یا کەسی ونبوو.

**سۆراڤ** (باد.): ناوی جوورە ترێیەکیە.

**سۆراڤک** (باد.): جوورەباڵندەیێکە وەمراوی دەچی، سوورە قانک.

**سۆراڤک** (باک.): خەنەیی، ڕەنگی سوور.

**سۆران**: ناوی پیاوانە. ناوی هەرێمێکی کوردستانییە لــە نێوانــی زێــی گەورەو گچکەدا. ـــ ە: سوورانە، پارەیێکە، کەمیری لە زاوا یـا لەکەس وکاری زاوای دەستێنێ.

**سۆرانی** (زا.): هەرمێ لاسوورە. جوورە هەڵپەڕینێکە. دانیشتووانی خاکی سۆران. ئەنگوچک، کلکەنگوچک، کەلانگوچک، ئاوستێ، لەوەندی، فەقێیانە، ئاسووێنە، لیفکە، قۆچکە، (ئەردە.) قۆچکەی سۆرانی.

**سۆراو** (باک.): جوورە ترێیەکە. (خۆ.) گیایەکە نیوگەز بڵند دەبێ و وەکوو پیوازی وایە بەساواری دەخورێ. (هەو.) گوڵەمەخمەری، سووراو، گەڵای ووردە لەناو شینایییاندا سەوز و باڵێک بڵنددەبێ، گەڵای لەهی سڵقی گچکەترە.

**سۆراهی** (باک.): سوورێتی.

**سۆرە** (باک.): سووڕانن، گەڕان.

**سۆرە**: سوورە، ڕەنگی سوور. بۆنە، بەهانە بە ـــ ی تووڕەهاتم: بەبۆنەی تووڕەهاتم. بڕوانە: سۆرەو تۆرە.

**سۆرەبی** (باک.): دارەبی سوور.

**سۆرەدار** (باک.): جوورە دارێکی سوورە.

**سوورەفیلک** (باک.): باڵندەیێکە.

**سۆرەفیچک** (باک.): باڵندەیێکە.

**سۆرەکە**: سوورێژە.

**سۆرەلانی** (دەر.، هەورا.): سۆرک، جێگای گڵەکەی سووربێ.

**سۆرەوتۆرە**: سۆرە، تۆرە، بیانی، هەنەزاگ، کەس و کاری شــوو (مێرد) بۆ ژنەکەی دەبنە سۆرەو تۆرە و هی مێرد دەبنە هی ژنەکەی.

**سۆربلەتی**: سۆبلەتی، گوێژە، موورە.

**سۆربۆز**: وولاخێکە ڕەنگی تووکی سووروسپی بێ.

**سۆرپاز** (زا.): جوورە سیرێکی کێوییە.

**سۆرزەرد** (باک.): سوورێکە بەزەردی بڕوانێ.

**سۆرزەندەلّ** (بابا.): سوورێکی پرتەقاڵییە.

**سۆرژە** (خۆ.): سوورێژە، سۆرکە.

**سۆرسان**: شارێکە نەوشیرەوان ئاوەدانی کردۆتەوە.

**سۆرسپیک** (باک.): گیایەکە.

**سۆرسۆرک** (باک.): ترترۆک، سوورێنچک، بۆڕی چیکڵدانە.

**سۆرڤە** (باک.): مەیلەوسوور.

**سۆرک**: (دەر.) سوورەلانی، جێگایەکە گڵەسووربێ. (کە.) سوورێژە، (باک.، خۆ.) سۆرک. هەرزن.

**سۆرکا**: ئێلێکی مەزنە کەوتۆتە ژێری ڕۆژهەلاتی شاری دیرکا، چیای مازی، میری سۆرکا لوێ هێلیّ ناودارن وەهاڕەنگە گوندەک بێ کەوتۆتە ڕۆژهەلاتی شاری ئاموودێ.

**سۆرکە**: سوورێژە. میوژی سوور.

**سۆرکەڵە** (هەو.): گەنمێکی سوور و وورده بۆ نان باشە، کە یەکێکە لە سێ جوورەکانی گەنمی قەندەهاری، (هەورا.) گەنمەسوورکە.

**سۆرگە**: (؟).

**سۆرگوڵ** (باک.): جوورە گەنمێکە وەڕەشگوڵی دەچێ، بۆ ساواری دەبێ، بە گوڵی گوڵاوێش دەڵێن.

**سۆرناتک** (باک.): سوورناسک، زووڕناتک، گیایەکی بێ گەڵاونەرمە لە نێولانکێ دەڕێ، وولاخ بیخوا بەتەڕی دەمرێ یا کوێردەبێ یا پێی دەنگوێ یا چەند جوورە برینێکی دەردەکات.

**سۆرنجان** (کە.): (کە.) خۆلنجان، گیایەکە.

**سۆرنگ**: ئاخ یادەرمانێکی ناودارە پەزی پێ نیشاندەکەن. گیایەکە. کەمترین پایەیەکە لە کۆمەیەکی.

**سۆرۆ**: ناوی گەڕناسێکی چیرۆکی (ڕەشۆی داری) چیرۆکەکە، بەتایبەتی باسی نەتەوەی کورد دەکات بەشێوەیێکی گۆوەندی بلاوکراوەتەوە.

**سۆرهەشین** (باک.): سوورەشین.

**سۆریٚ دەسیٚ**: (؟).

**سۆریٚنە**: ـــ ی ئاشی، ئەو لوولەیە، کەگەنمی پیٚدا دەکونی بەرداشی دەکریٚت، (هەورا.) پلووسکە.

**سۆریانە** (باک.، ڕەوا.، خۆ.): (باک.) سۆریازک، گیایەکی بەهاری و لاسک سوورە گوڵی سپیەوبۆنی خۆشە بە چیٚشتی ساواری لیٚدەنریٚ.

**سۆریازک**: سۆریاز.

**سۆریاس**: گیایەکی کویٚستانییە گەڵای وەکوو کەوەری وایە بەڵام باریکترە و دەکریٚ بە چیٚشت.

**سۆربچک**: سۆریٚنچک.

**سۆریشک** (خۆ.): ئەو بۆڕی و لوولەیەیە، کە خواردەمەنی و چتی پیٚدا دەچیٚتە خوارەوە، سوورینچک، سوورناتک.

**سۆریکە**: سووریٚژە.

**سۆرینە**: سۆریٚنە. پلووسک، سۆریسکە، ئەولوولەیەیە، کەگەنم و دەغڵ و دانی پیٚدادەکریٚتە نیٚوکونی بەرداشی ئاشییەوە.

**سۆز**: لاواندنەوە، گریان بە هیٚمنی. (کە.) گۆرانییٚکی دەرویٚشانەیە. تاقۆیی. کرڵی گریان. هەوا، سەودا، ئاهەنگ، شەوق، کەیف: دارا زۆر بە ـــ ە. (هەورا.) سەووز، سەوزە. گۆرانی بە سۆز وبە کوڵ، کاریگەر. بە ـــ: کاریٚگەر، بیٚ ـــ: ساردوسڕ.

**سۆزان** (کە.): سووتان. ـــ دن (کە.): سووتاندن. ـــ ی: بڕوانە: سووزانی.

**سۆزە**: ـــ ی بای: بای نەرم، نزە، هەناسەی بای، کزەی بای سووک، سۆز. (زەن.) بایەکی نەرمە لەشنەی بیٚهیٚزترە، بای فیٚنکە، کزەبا. (هەورا.) سەوزەئاواز. ـــ کردن: سۆزکردن.

**سۆزەوەڕەش** (هەورا.): سەوزەفرۆش.

**سۆزەی هگۆرانی**: جۆشی گۆرانی.

**سۆزەرەت** (باک.): سقن، ئاشنا، ناوێزە، چتی سەیر.

**سۆزکردن**: گۆرانی کوتن بەسەرخۆشەویستیٚکا بە دڵیٚکی گەرمی بە کرڵەوە.

**سۆزمانی** (هەورا.): جندە، سووزمانی، (ئەردە.) لەوەن.

**سۆزمە**: چیٚشتی ماشی ڕەشە، کەپاکرابیٚ و برنجیشی تیٚکرابیٚ.

**سۆزی** (هەورا.): سەوزەوات. (سنە.) سبەینیٚ، سۆزوو.

**سۆزیاگ**: سووتاو.

**سۆزیان** (کە.): سووتان. سووتان لەتینوان.

**سۆزیاو**: سووتاو، ئاورتیٚبەربوو.

**سۆزی گۆرانی**: کوڵی گۆرانی.

**سۆژ**: سۆز.

**سۆژان** (باک.): سووتان.

**سۆژە**: بیٚگار.

**سۆژتاندن** (باک.): سووتاندن.

**سۆس** (هەورا.، بابا.): کەپەک، پووشی ئارد. (هەورا.) سۆسکە، (ئەردە.) ئەسپیٚی گەنمی.

**سۆسەلی**: بزنی ڕەشی دەم و چاوسوور.

**سۆسەن**: سۆسن، گوڵیٚکی جوانی بۆنخۆشە وگەڵیٚ ڕەنگی هەیە، ناوی ئافرەتانیشە.

**سۆست**: سۆس.

**سۆستی** (خۆ.): گیایەکی گوڵزەرد و بۆنخۆشە گەڵاشی وەکووهی نیٚرگزی وایە و بەقەد ویش بەرزدەبیٚ.

**سۆسەرەت** (باک.): سۆزرەت، ناوێزە، ئاشنا، زۆرسەیر.

**سۆسک** (ئەردە.): ئەسپیٚی گەنمی، سۆس، سوویٚسکە. کەپەک. سووسکە، سوورەباڵە.

**سۆسکە**: سوویٚسکە، زڕەکەو.

**سۆسن**: گوڵەسوویٚسنە، سۆسەن، سپی و زەرد و سووری هەیە و هەمووشی زۆر بۆنخۆشن.

**سۆعانا**: ئیٚلیٚکی کوردی یەزیدین کەوتوونەتە ژیٚری ئاموودیٚ.

**سۆغانا**: گوندیٚکە کەوتۆتە ژیٚری ئاموودیٚوە.

**سۆغرە**: بیٚگار، سوخرە. ـــ پیٚکرن: بیٚگار و سوخرە بە مەردوم کردن.

**سۆغن**: داوی هاتیە، دبیٚژن شەرەدەست پیٚکریە سۆغی ئەم چبکەین.

**سۆغین** (زا.): ئەنجامی کار.

**سۆفاح**: (؟).

**سۆفەقیٚتە** (هەر.): کڵاوکورە، سۆفیلکە، جوورە بۆلەکەیەکە تووکیٚکی لە تۆقی سەری قیت بۆتەوە.

**سۆفی**: ڕیشدریٚژ و خوداپەرست.

**سۆفیاوسافیا**: دووگوندن لە ڕۆژهەڵاتی شاری ئامیٚدیٚ (دیاربەکریٚ) گۆرانی خیٚریا جیٚ و باقی بهجت ژگوندیٚ سافیادەرکەتیە.

**سۆفیلە**: داریٚکە لە نیٚوخەرمانیدا دەچەقیٚنریٚ دووای سوورکردن.

**سۆفیلکە**: کڵاوکورە، فشەکڵاون، باڵندەییٚکی چکۆلەیە چەند پەڕیٚکی لەسەر تۆقە سەرییەو بە پشتەوە داشکاوەتەوە، چوورەپۆپنە، سۆفەقیتە، (باد.) تیستی. مەردومی ڕیشدریٚژ وخواپەرست. جوورە پەپوولەییٚکەلەشکل و شیٚوەی کرلەو بیٚ باڵە وگچکەو سەرزکارە.

**سۆڤ** (باک.): قاتی، قاتی و قڕی، گرانی.

**سۆڤانی** (هەر.): سبەینیٚ، بەرانبەری ئیٚواریٚ.

**سۆڤان** (کە.): ئیٚسک.

**سۆڤی** (باک.): جووانووئەسپ، دەسکاورنگ، دینگی برنجی.

**سۆک**: کوت، سووک. (ئەردە.) کەم، ئاسان، کوێتیەکەی.

**سۆکە** (ئەردە.): سووژن.

**سۆک**: جلف، هەرزە.

**سۆکەسۆک**: کوت پیٚوەدانی یەک لەسەریەکتری، سووکەسووک.

**سۆکباری**: بارسووکی.

**سۆکدان** (ئەردە.): کوتوەشاندن.

**سۆکدەس** (ئەردە.): دەست سووک.

**سۆک کردن**: ئابڕووبردن.

**سۆکی** (ئەردە.): سووکی.

**سۆل:** کەوش، پێڵاو، پاپۆش، کەوشی پەل و سووک، جۆرە پێڵاوێکی سووکە.

**سۆڵ** (هەورا.): سوویر، پڕخووێ. (موک.) سپی بەڵان بەتەنێ بەکارنابرێ دەڵێن سپی وسۆڵ. بەواتاسفت بەڵان قەت بەتەنێ بەکارنابرێ: دەڵێن سفت و ــ : واتە زۆر سفت.

**سۆلاف:** تاڤگە، ناوی شوێنێکیشە لەناوچەی ئامێدیێ.

**سۆلان** (ئەردە.): نەژاد و ڕەسەن.

**سۆڵان:** گیایەکە هەرکەسێ لە باخەڵی بنێ کێچ و ئەسپێی نابێ، گوڵی سەوڵ، (ئەردە.) هنگوان.

**سۆلانەوە:** چووزانەوە.

**سۆلاندنەوە** (ئەردە.): چوزاندنەوە.

**سۆڵانەوە:** سۆڵاندنەوە، تۆزاندنەوە، کزاندنەوە، سووتاندنەوە.

**سۆلاوکە:** پلووسک.

**سۆلاهەسپی** (باک.): ناڵ.

**سۆڵە:** سەرمای بە تەوورژم، سەرماوسۆڵە، زوقم. شۆقێکی کەم، کە لە دوورەوە دیاربێ. (ئەردە.) بڵێسە، تاو. ناوی چواردێیانە لە ناوچەی بازیان، قەرەداخ و مەریوان. چەند دانە سینگێکی باریک و نووک تیژە بەرماڵە هەتیوەی دەواری پێ قایم دەکرێت.

**سۆڵەچرا:** چۆڵەچرا، شەوچرا.

**سۆڵەسۆل** (ئەندام): کزەکز، سۆزش، سۆڵکە، چووزە چووزی ئەندام. نێو زارم ــ ی لێوەدێ.

**سۆڵەک:** (؟).

**سۆڵەکە:** سووێرەکە، کەشکی تەڕ.

**سۆلەم** (باک.): لاسکی دەغڵانی درواو.

**سۆلبەند** (باک.): ناڵبەند. (باک.) ــ ی: ناڵبەندی.

**سۆلدروو:** کەوشدروو، سۆلکار.

**سۆلسۆ** (شا.): بێچووە دووپشک.

**سۆلسۆڵە:** جۆرە دووپشکێکی ڕەشکاری زۆرگچکەیە.

**سۆلک** (باک.): کەوش.

**سۆڵکە:** سووێرەکە.

**سۆلکەر** (باک.): کەوشدروو، کەوشکەر، سۆلدروو. ــ ی: پیشەی دروستکردنی سۆل.

**سۆڵوخووا** (ئەردە.): چتی زۆرخووێ، شۆرمەزە.

**سۆلۆلە:** بێچووە دووپشک.

**سۆڵی** (هەورا.): سوویری.

**سۆڵیانەوە:** ئاوی بەستوو، کەشۆڕبێتەوە. (ئەردە.) چووزانەوە، تۆزیانەوە، کزیانەوە.

**سۆڵیتی:** شووشەئاوی بەستوو، کە لە پلووسکی داروباران و دیواران شۆڕدەبێتەوە، چلوورە.

**سۆلینە:** گونجی ئاو.

**سۆڵینەوە:** سۆڵانەوە.

**سۆما** (کە.، ڕۆژ.): کونی دەرزی. بێ ــ: بێ کون. (کە.، ڕۆژ.) ناوەندی هەردووک پێڵووی چاوییە. ئاسۆ. (هەورا.) ڕووناکی چاو، بینایی چاو، حەمەئاغای دەربەند فەقەرە دەڵێ:

ئاخ سا بۆ چ سۆمای دیدەم تارنەبێ

زیندەگی لەلام ژاری مارنەبێ

ڕۆشنایی، هێزی دیتن، توانای بینین.

سۆمایی

**سۆمایی:** بیبیلەی چاو.

**سۆمایی داهاتن:** مەبەس لە کوێربوونە.

**سۆمۆ:** ماڵە سومۆ لە ناڤ میرسینا هەبوە.

**سۆنە** (کە.، ڕۆژ.): بۆنە، هۆ. (باد.) وەردەک، نێرەی مراوییە و سەری کەسکە، سەرسەوز. (هەورا.) سینگ، سنگ. پنجەگیایەکە لەدەم ئاواندا شین دەبێ و پەلکەکانی خڕن و سێ سێ پێکەوەن ڕەنگی سەوزێکی کراوەوەیە تەنها بستێک بڵندەبێ و هەمیشە هەیە، کە لەگەڵ کەمێک ئاوی بکوڵێنی بۆ برین برژاندنەوە زۆر باشە، بەوورددیش بکرێتە مەڵحەم بۆ برینان باشە.

**سۆند:** سوێند، سوند.

**سۆنگە** (ڕۆژ.): هۆ، بۆنە، سەبارەت، دەست پەرژان، لەدەستهاتن، دەرفەت.

**سۆوتە** (ئەردە.): چتێکەلایەکی سووتابێ.

**سۆهتن** (باک.): سووتان.

**سۆهتی:** سووتاو.

**سۆیە:** سبەی.

**سۆیتەلی:** مەردومی هەڵەشەی سەرسەری.

**سۆی ڕۆخلا** (هەورا.): سۆی ڕیخۆلان.

**سۆی زوخاڵ:** (؟).

**سوپا:** لەشکر.

**سوپات** (هەورا.): سپات. ڕەنگی قاوەیی.

**سوپاخانە:** سپاخانە.

**سوپاران:** سپاران. ــ ی: سپارانی.

**سوپاس:** پێزانین، ماڵ ئاوایی، ستایشی یەکێک لە پێناوی چاکەدا.

**سوپاسالار:** لەشکردار، سپاسالار.

**سوپاسبژێر:** سوپاسژمێر. ــ ی: پێزانین، سوپاسکردن، سوپاست دەکەم، لەمنەت کەوێ.

**سوپاسکردن:** ماڵیاوایی کردن، پێزانین.

**سوپاسگوزار:** پاپا. ــ ی: پاپایی.

**سوپاگا:** لەشکرگا، سپاگە.

**سوپای کوردستان:** لەشکری کوردستان.

**سوپەر:** خەندەک، لە خەزەگ گچکەترە، تابیە، سەنگر، سپێر، سپەر، سووپێر، کەلێنێکە لە سەر زەوی بۆ شەڕێ دروستدەکرێ.

**سوپێر:** سوپەر.

**سوچیای:** سووتان.

**سوخاڵ** (ئەردە.): زووخاڵ.

**سوخاڵدان** (ئەردە.): زوخاڵدان.

**سوخال** (فە.): ئێسک.

سوخال

**سوخت** (دزە.): شێوە، وێنە.

**سوخت**: مرۆی بێ پارەوپوول، پەستی زوویر، سۆخت.

**سوختە**: قوتابی سوختە، کەسێکە لە مزگەوتاندا تازە دەستی بە خوێندن کردبێ و کاروباری مامۆستاش هەڵسووڕێنێ.

**سوخت بوون**: بێ پارە وپوول و سامان بوون. ـــ کردن: داماڵەغاسی کردن، ڕووتکردن و هیچ پێ نەهێشتن.

**سوخرە**: سوغرە، بێگار.

**سوخمە** (هەورا.): سیخمە. دارێکە دەچەقێنرێ و مێوی دەخرێتەسەر.

**سوخورمە**: سیخورمە.

**سوڕ** (ئەردە.): شووێنی لێژ و خزو سەربەرەوخووار.

**سوڕاند**: سووڕاندن.

**سورتک**: بێشەرم، بێشێواز.

**سورخ**: دەرمانێکی سوورە وەکوو کل وایە، دەگیرێتەوە و چتی پێدەنووسرێ.

**سورخکار**: کەسێکی بەسووری بنووسێ یادیوارو چتان سووربکات. ـــ ی: سوورکاری.

**سوڕسوڕە**: باڵندەیێکی گچکەی گێژ و نازیرەکە.

**سورمە**: کل. چتێکی باریکە وەکوو دەزوو لە زێوی دروستەکرێ بۆ دۆقی عەبا و گوڵنگی چەفتە و چتی ترو شاڵوشەپک. ـــ دان: کلدان، ناڵقە ناسێکە بەم سەرەو سەری توێی جەنجەڕەوە لەمسەرەوسەرەوە میلەکانی لەنێوەدەنرێ.

**سورمەڕێژ**: کالا یا چتێکە بەسورمە جووانکرابێ.

**سورمەڕێژی**: کل لە چاوکردن، چاوڕشتن بەکل.*

**سورمەیی**: ڕەنگی شینی تاریک.

**سوڕنا**: زوڕنا. ـــ تک: زوڕناتک. ـــ ژەن: زوڕناژەن.

**سورەنج**: گۆگردو جیوەیە، کە ڕەنگیان سوورە چتیان پێ دەنەخشێنن.

**سوروشت**: خووی مەردوم.

**سورنجان**: (؟).

**سوروشتی**: چتی سرشتی.

**سوڕیان** (ئەردە.): خلیسکان.

**سورین**: کەفەڵی مرۆڤانە، ئەولاولای کۆمییە، سمتی مرۆڤان.

**سوکوم** (زا.): تەحر و شێوە.

**سوڵ** (ئەردە.): سڵ.

**سوڵت** (ئەردە.): ڕووت و قووت.

**سوڵتان**: (؟).

**سولتان**: جوورێکی لەزاخە.

**سولوسات** (زا.): کۆبوونەوەی پیاوان بە زۆری.

**سومووڵ**: گوڵێکی بۆنخۆشی ناسراوە.

**سون**: سن، کیسەڵە.

**سونبول**: گوڵێکە.

**سوند**: بڕوانە: دوند، سووێند.

**سونکە**: وورردەکەشکێکە دووای سوونەوەی مابێتەوە. بنیسکە سابوون.

**سونی**: نێزە. کەسێکە، کەلەسەر پەیڕەوی پێغەمبەرویارانی بێ.

**سوها**: مەهارکێش.

**سوهتن**: سووتان.

**سوهتی**: سووتاو.

**سوهون** (زا.): سام، ترس.

**سوو** (ڕەوا.): دژ، بەپێچەوانە، لە ـــ ی منە: دژی منە. ئێش، ژان. چووکڵ، گرێ، سووچ. (فە.) سبەینێ. (ڕەوا.، دزە.) هەوا، سارد. ـــ ی سارد: هەوای سارد. (ڕەوا.) پەرۆش، خەم، خەفەت، حەیف، سووی. ـــ بوونەوە، ـــ لێ بوونەوە: بەپەرۆشبوون، سووێ بوونەوە. لێ ـــ بوون: بەپەرۆشبوون. کەنار، ئاسوو، لا، قوژ، کەل، سووێ، سووێگە، کەلەمل، ئاسووگە. دیو، ڕووکار، ئەودیوی کێوی. گومان، نیگەرانی، دلاّودڵی، دوودڵی، هەنا. بێ ـــ: بێ گومان، بێ دلاّودڵی. سەختیان. ترفە، هاشە. سوود، قازانج، پەچ، وەچ، مردە، ئەمکارەی بێ سووە: واتە بێ کەڵکەو بێ سوودە.

**سووا** (ئەردە.): سبەینێ.

**سووابی** (باک.): هاشەی با.

**سوواپ**: ساپ.

**سوواخ**: سوواغ. ـــ دان: دووین، ناوینەوە، لەپەدان، کاگڵ کێشان، شمشەکێشان. ـــ کردن: سەیاندن، هێسین، سوواغکردن. ـــ کێشان: سوواغدان.

**سووار**: منداڵێکە لەکاتی لە دایک بوونیدا لەپێشەوە لاقی بێ. نێوی نێرینانە. سوویار، کەسێکە بەسەرپشتی وولاخەوەبێ، کەسێکە سوواری وولاخ یا هەر چتێکی بووبێ، بەپێچەوانەی پیادەیە. دەستەسووار: تیپ، سەمەر. مەبەس لە چتێکیشە، کەبەسەر چتێکیتردا زاڵ بێ، پەنجەرەی ئێوە بەسەر حەوشی ئێمەدا سووارە، چیرە.

**سووارە**: سووالە. کەسێکەبە سوواری بڕوات بە پێچەوانەی پیادە. کۆمەڵە سووارێک. ـــ درە: سووالەدرە.

**سووارەوپیادە** (موک.): گوڵ و بۆق، دەغڵێکە هێندێکی گوڵی کردبێ و هێندێکیشی لە بۆقدابێ.

**سووارەی شەترەنج**: ئاوە بۆ شەشدامەی شەترەنج، کە پێیان دەڵێن شا، وەزیر، فیل، ئەسپ، ڕوخ، پیادە.

**سوواربوون**: سوواربیەی.

**سوواربیەی** (هەورا.): سوواربوون.

**سووارچاک**: سووارخاس. ـــ ی: سووارخاسی.

**سووارخاس**: سووارچاک، کەسێکە سوواری باشبزانێ. ـــ ی: سووارچاکی.

**سووارخە** (زا.): چیلکە.

**سووارسووارێن** (موک.): بارباران، بابارکێ.

**سووارکردن:** پیادەیەک کردنەسووار. مەبەس لە ڕاپەڕاندنی کارێکییە. ئەم کارە زووسووارکە. ـــ ی دەمانچە و تفەنگ واتە ئامادەکردنی بۆ تەقاندن.

**سووارۆ:** مەقامێکە ئایشەگۆڵ بۆ سلێمان بەگی داناوە.

**سوواری:** بوونی مەردوم بەسووار، بە ـــ چوومەسەردەشتێ. ـــ پێکردن: فەنتازی کردن.

**سووارغ:** قوڕ یا گەچێکە، کەبەدەست یا بەماڵە لە شووێنێکدرابێ. ـــ دان: سوواخدان، تێهەڵسوونی قوڕ یا گەچی گیراوەوە بەدەست یا بە ماڵنج. ـــ کێشان: سوواغدان.

**سووافـ** (باک.): سوولاڤ، تاڤگە.

**سوواق** (هەورا.): ساخ

**سووالْ:** دەرۆزە، گەدایی، لەتەچنی.

**سووالە** (دزە.): سووارە، باقەی دەغڵ و گیایە بەلاّن لە گەرمێنێ نابەسترێ. قولیک گەنم، جۆ یامەرەزەیە، کە سەپان دروویێتیەوە و بەلاّن هێشتا دای نەنابێ.

**سووالەت:** گۆزەکوت، ئەشکەلک، ئەشکەولەت، لڤن.

**سو:** پارچەی دیزەو گۆزەو دەفری گلێنەی شکاوە، ئاوی تێدا دادەنێن بۆ مریشک و سەگان.

**سووالەدڕە:** چڵەگیایەکە ئەژنۆیەک بڵند دەبێ گەلاّیەکانیشی وەهی گۆگەمی دەچن، کەنارەکانی خانەخانەیە هەرلکەی لە نێوە ڕاستیەوە تا سەری گەڵێک گوڵی زەردو وورد دەردەکات، سووارەدڕە، گووێ بەد.

**سوالەلەت:** سووا لەتێکی شکاوە ئاوی تێدەکەن بۆ سەگ و مریشکان.

**سووالک:** کۆتەرەدارێکی هەڵکەنراوە یا سووالەتێکە بۆ ئاو تێدا خواردنەوەی سەگ.

**سووالکەر:** دەرۆزەکەر، خووازۆک، خوواز خووازۆک، دەرکۆدەرکۆ، لەتەچن، لەتەچێن، خووازەلۆک، گەدا. ـــ ی: دەرۆزەکەری، گەدایی.

**سووالکردن:** پارسکردن، دەرۆزەکردن، پەسنی کردن، خووازۆلێکی چت لەمەردوم.

**سووان:** لووسبوون و نەمانی زبری چت، کولبوون. (ڕەوا.، هەورا.) سووانده. جوورە هەڵوایێکە. خشان، سووانەوەی تیغ و داس و سمی وولاّخان. بڕیەند، کارتیغ. (کە.) کولبوونی تیغ و لە کارکەوتنی تیغ بە جۆرێک، کە بەهەسان تیژنەبێتەوە. چەقسووبوون، شەرم شکان.

**سووانە:** گووێ بان، سووانده، (هەورا.) گووێ سووانە، پاسارە.

**سووانەوە:** ساوینەوە، سوونەوە، لووسبوون و چوونەیەکی لباد و فەرەنجی لەبەر زۆرسوونەوەی. سووانەوەی کەشک و چتی تر، بەهەڵگلۆفتن و خستنی لە چتێکی تر، کەشکەکە سووا‌وەترە.

**سووانده:** هەرەبان، سانده، گووێ بان، گووێسووانە، (هەورا.) پاسار، سووان، کەناری بانی، (مامە.) مێشرەو، ساپیتە، (دەر.) سووانە، (پێن.) گووێسەبانە، (زا.) سوواندەر.

**سووانەر** (زا.): گووێسووانە.

**سووانن:** نەهێشتنی زبری چت.

**سووانەنەوە:** سوونەوە.

**سووانۆکە** (هەو.، بار.، خۆ.): (هەو.) سوواندیلکە، پاساری، (ڕەوا.، خۆ.) سووانکێ، چۆلەکەی نێرومێ، پاساری، سواندوکە، سواندولکە.

**سووانووکە:** سوانۆکە.

**سووانوولکە:** سو.

**سوواندیلکە** (هەو.): پاساری و چۆلەکە.

**سووانکێ** (ڕەوا.): سوانۆکە، پاساری، چۆلەکە.

**سووانن:** سوواندن، سوونەوە.

**سووواو:** تیغ و داسی سوواو، سایراو، چتێکەلووس بووبێ و برگەی نەمابێ. چەقسوو، بێ ئابڕوو، بێشەرم، ڕوودامالْراو، چەختی، چەختی چۆپان، پەل، چوختی.

**سووواوە:** سووراوەوە. ـــ ی: سووراوەوەیی.

**سووواوی:** بێ چاووڕوویی، ڕوودامالْراوی.

**سووەی:** سبەی.

**سووەیل** (ئەردە.): ئەستێرەی سیوەیل.

**سووبا** (زا.): مەلەوان. (باک.) ـــ هی: مەلەکردن.

**سووپ** (زا.): چەند بەردێکە لەبەر بانی ئاودا دادەنرێ و داری بەسەردا ڕادەدەنگێورێ بۆ ماسی گرتن.

**سووت** (باک.): تەڵە، داو، چاڵێکە تەپکەی لەسەردادەنرێ بۆگرتنی هەندێ باڵندە. فیتفیتە، فیکفیکە، س(هەو.) ڕیێدە، ڕوبێدە، مردە، قازانجێکە لەپارە بەقەرزدانیدا وەردەگیرێت.

**سووتاو:** مەردومی سەرسەری.

**سووتار** (زا.): قووڵ.

**سووتال** (باک.): قووڵ، سووتار، (باک.) ساکوول.

**سووتان:** سۆزیان، سۆهتن، سۆتن، گرگرتن، (هەورا.) سۆتەی، سۆچیای، سزیان، گڕان، شەوتین، شەوتان، ئاوورتێبەربوونی چتێک و نەمانی.

**سووتانەوە:** سووربوونەوە و هەڵزلەپانی شووێنێک لەئەندام بەهۆی تەڕبوون و زۆر مانەوەیە لەتەڕیدا.

**سووتاندن:** سۆهتن، شەوتاندن، گرتێبەردان، ئاوورتێبەردان، سۆزاندن، کەماندن، سۆژتاندن، گڕدان، ئاگرتێبەردانی چتێک و نەهێشتنی.

**سووتاندنەوە:** سووتانەوە.

**سووتانن:** سووتاندن.

**سووتانی** (ڕەوا.): دارێکە لەناو کۆمەڵە دارێکیدا، کە بۆ ڕەزی هەموو سووتابێ تەنها هەر ئەو لق و پۆپ و تێکوڵەکەی سووتابێ.

**سووتاو:** سفتە، چتێکەئاگری تێبەربووبێ. نێوی نێرینانە.

**سووتاوە:** شووێنێکەسووتابێتەوە.

**سووتە** (بار.): تەپکە. سووتوو، سووتاو، سووتیاگ.

**سووتەڵ:** چتی نیوەسووتاو.

**سووتەکە** (شەق.): جوورە ئازارێکی دارویارانە پەلکی دارەکەی کەم و زۆر ڕەش دەبێ.

**سووتەمەڕۆ:** داری نیوەسووتاوو هەڵپرووزاو، سەلکەبزووت.

**سووتەمەنی:** دارودەوەن و هەموو چتێکی، کەبۆسووتاندنێ دەست بدات، ئاووردوو، سۆتەی، سۆتەن، سووتەنی، چتێکە دانرابێ بۆسووتان.

**سووتەنی:** ئاووردوو، سووتەمەنی، سۆخت.

**سووتەی** (هەورا.): سووتان.

**سووتخۆر:** مردەخۆر. ــ ی: مردەخۆری.

**سووتک** (کە.): سووتووی جغارەوسەبیلەو چتی دیکەیە، پووڵ.

**سووتکچرا** (ئەردە.): سووتاوی چرا.

**سووتن:** سوونەوە، تیژکردن.

**سووتوو:** ــ ی جغارەی: سۆتەک، (کە.) سووتک، خۆڵەمێشی سەبیلە و قەننەی، چتی سووتاو، خۆڵەمێشی چتی سووتاو. مردوو، لەجێی ــ ان لە جێی مردووی خۆشەویست، تەنها بۆ منداڵێکی دەبێ، کە بۆنی یەکێکی مردووی لێ بکەن.

**سووتووان:** لەجێی ــ: لەجێی مردووان.

**سووتێن:** چتێکە، کەبسووتێنێ، سووتێنەر، (هەورا.) شانە.

**سووتێنەر:** سووتێن، گڕتێبەردەر.

**سووتیان:** سووتان.

**سووتیانەوە:** سووتانەوە.

**سووجەرگ** (ئەردە.): سیوجگەر.

**سووجق** (ڕۆژ.): پلار، چکڵە دارێکە لە هاوێژتنێدا بچەقێتەوە.

**سووجگەر** (ئەردە.): سووجیگەر. سوورەوکریاگ.

**سووچ:** تاوان، گوناح، کاری ناڕەوا. بە ــ: بەزە. بێ ــ: سەوس. گۆشە، کونج، کونجووڵ، قولینچک، قوژبن، هارس. ــ ەڕ: داعبایەکی کێوی دڕکدارە دڕکەکانی لە سووژن گەورەترە و بەڵەکە. (کە.، هەورا.) سیخوڕ، سووچەڕ.

**سووچەری:** (؟).

**سووچبار:** تاوانبار. ــ ی: تاوانباری.

**سووچدار:** کۆشەدار، قولینچکدار. بەزەکەر، تاواندار، گوناهبار، خووەی سووچ. ــ ی: بەزەکاری، سووچکردن.

**سووچکردن:** پیازەکردن.

**سووچنای** (هەورا.): سووتاندن.

**سووچێو:** مەقەڵی.

**سووچیای** (هەورا.): سووتاو.

**سووح:** سبەینێ، بەیانی.

**سووخار** (زا.): بەڵمی برنجی.

**سووخاڵ:** ڕەژی، خەڵووز. ــ دان: خەڵووزدان.

**سووختە:** قوتابییەکە سەرەتای خوێندنی بێ.

**سووخمە** (هەورا.): سیخمە، کەمەری، سەڵتە.

**سووخۆر:** سوودخۆر، مردەخۆر. ــ ی: سوودخۆری، مردەخۆری.

**سووخوڵمە** (کە.): سیخوڕمە، لەقە برغەدان، نقوورچک.

**سوود:** چەخش، دەرامەد، قازانج، کەڵک، کێر، داهات. بێ ــ ی: بێ جێیی، بەخۆڕایی، بادی هەوابێ. بە ــ: بەقازانج، بەکەڵک، بەردار، ئادان، (باک.) دابەر. بێ ــ: بێبەر، بێکەڵک، بێخێر، بادی هەوا، خۆڕایی.

**سوودپەرست:** قازانج پەرست.

**سوودار:** گوماندار، بەگومان. ــ ی: گومانداری، بەگومانی.

**سوودپەرستی:** قازانج پەرستی.

**سوودپەروەر:** سوودپەرست. ــ ی: سوودپەرستی.

**سوودخۆر:** مردەخۆر. ــ ی: مردەخۆری.

**سووددار:** بەکەڵک. ــ ی: کەڵکداری.

**سوودکردن:** قازانج کردن، بردنەوە، کەڵک و بەهرە پێ گەیین، پارەدان یاوەرگرتنی بەسوود.

**سوودمەند:** قازانجکردن. ــ ی: قازانج لێکردن.

**سوودوەر** (هەورا.): سوودخۆر. ــ ی(هەورا.): سوودخۆری.

**سوور:** ڕەنگی خوێن و گوڵە خاشخاشی سوورە، ڕەنگی گوڵە مێلاقەش سوورە، سۆر. ڕوون، ــ بوونەوەی نان و گۆشت: باشبرژان، ــ بوونەوە: ڕوون بوونەوە، دەرکەوتن، قژلین، ئاشکرابوون. ــ کردنەوە: ڕوونکردنەوە، قژیلاندن.

**سوور** (لک.، فە.): بووک. گەرم، دژی سارد. (کە.، لک.): شایی و زەماوەند. (باد.، هەو.) سوویر، (ئەردە.) ڕژد، شێلگیر. (باک.) زیز، زوویر. سروە، شنەی با، بای فێنک.

**سووڕ:** واق، واق و وڕ، مات، شاش. خول، دەور، چەرخ، سەماگەڕان. ــ خوواردن: خولانەوە.

**سوورائ** (زا.): سووراو. ــ ک: سووراو.

**سووڕان:** چەرخان، خەمخوواردن.

**سووران** (فە.): شادمانی بووکێ، شایی.

**سوورانە:** پارەیەکە ئاغا لە زاوای دەستێنێ لەکاتی ژنهێنانێدا.

**سووڕانەوە:** خولانەوە، چەرخدان، گرواز، چەرخان، چەرخ خوواردن، گەڕانی مەردوومە بەبێ ئامانج.

**سووڕانتک:** سرناتک، زوڕناتک.

**سووڕانگەه:** شوێنێکەتێیدا بسووڕێتەوە.

**سووڕانچک:** سووڕێنەر.

**سووڕاندن:** سووڕانن، هێلانە، شەلخاندن، چەرخاندن، گەڕدان، خولاندنەوە، گەڕاندن، خول پێدان، سووڕاندنەوە، نقراندن، چەرخدان بە چتێک. هەڵخەڵەتاندن، سەری ئێستر و گوێدرێژ و بەراز.

**سووڕانن:** سووڕاندن، خزاندن، خشاندن، خولانن، گەڕانن.

**سووڕاندنەوە:** خولاندنەوەی چتێک.

**سووڕاننەوە:** سووڕاندنەوە، خولاننەوە.

**سووراو** (مک.): جوورە ترێیەکی سوور وسپییە گلووی خڕە و هێندەی گێلاسێکییە دەنکی هەیە و بۆ میلاق باشە وەکوو کاژاوی وایە. گیایەکی کێوی و دەستچێنیشە گەڵایەکانی سوورێکی قاوەیین و پانن گوڵی ڕیشاڵ ڕیشاڵە و بەژنێک بڵنددەبێ دووای ووشکبوونی گوڵەکەی تۆوێکی ووردی وەکوو زەنگیانەی تێدایەو دەترووسکێ و بەهەموو ڕەنگێکی دەنووێنێ،

گوڵمەخمەری، سووراو، قەدیفە، سەول. (موک.) جوورە گوزانییەکە. ڕەنگێکی سوورە ژنان لێوو ڕوومەتیانی پێ سووردەکەن، سووراڤک.

**سووراوە:** چتێکسووراپبێتەوە.

**سووراوکردن:** سووراو بەکاربردن.

**سووراووسپیاو:** دروەدەرمانی سووروسپین، ژنان ڕووی خۆیانی پێ جوان دەکەن.

**سووراووک:** قەزوانی سووێرکراو و ئیدی.

**سووراهی:** سوورایی.

**سوورایی:** سووراهی.

**سوورە** (ئەردە.): هەنەزاگ، زڕکوڕ و زڕکچ. زیڕە، قیژە، نووزە.

**سوورە:** خولە، چەرخە بەگردی چتێکیدا، خول.

**سوورەبا** (هەورا.): بای سوور.

**سوورەبەند:** لەبەیتی بارام و گوڵەندامێدا وادیارە وێنە (سورە) یە.

**سوورەبنە:** گیایەکە بەهاری و کوردستانییە دەکرێتە ناو دۆ کولێوەوە.

**سوورەبۆز:** سوورێکە بە بۆزی بنوێنێ.

**سوورەبی:** جوورە دارەبییەکی سوورە.

**سوورەپەڵ:** بنپەلک، بۆتووتن بەکاردەبرێ.

**سوورەپیاز** (هەورا.): ژەنگەسوورە. جوورە پیوازێکی سوورە.

**سوورەتا:** جوورە تایێکی بێ لەرزو مووچرکە سێ شەو و سێ ڕۆژان دەخایێنێ.

**سوورەتبەند:** سوورەبەند.

**سوورەترش:** سوورێکی پڕەنگە بە ڕۆنیاس و ڕۆنی دروستدەکرێ.

**سوورەتفی** (هەورا.): شاتوو، گاتوو.

**سوورەچنار:** جوورە چنارێکی زۆر بڵند و ئەستوورە، پەلک.

**سوورەچێو:** دارێکی سووریاوە بە قەد دارهەنارێکی بەرزدەبێتەوە گەڵای وەکووگەڵای دارەبەهێ و هەرمێی وایە.

**سوورەدار:** جوورە دارێکە وە داری بەڕووی دەچێ، دیداریشی پێدەڵێن.

**سوورەداڵ:** جوورە داڵێکە، بەڵام ئەم گۆشتخۆر نییە. ــ ە: سوورەداڵ.

**سوورەڕێواس:** جوورە ڕێواسێکی لاسک سوورە.

**سوورەڕێوی:** جوورە ڕێوییێکی سووریاوە.

**سوورەساقە:** بێچووە باڵندەیێکە هەر گۆشتی سووربێ و هێشتا تووکی لێنەڕوابێ.

**سوورەسلو** (هەورا.): سوورەسێو.

**سوورەشامی:** جوورە ترێیەکی سوورە گلووی لەساداتی گەورەترە.

**سوورەسوورا:** بەسووڕەسووڕی چاوی تەماشای دەکرد. ــ خواردن یەک لە دووای یەکتری. زووڕەزووڕ، نووزەنووز، گریان.

**سوورەقەنگ:** باڵندەیێکی سووروبۆر و ئاوییە وەکوو مراوی وایە، جوورە مراوییەکە، (هەورا.) گەرگەلاری، سۆراڤک.

**سوورەقولینگ:** باڵندەیێکە.

**سوورەکووان:** جوورە قوونیێرێکە.

**سوورەماسلو** (هەورا.): سوورەماسی.

**سوورەماسی:** جوورە ماسییێکی سوورە و گۆشتی زۆرخۆشە.

**سوورەمزە** (شو.): ژەنگەسوورە.

**سوورەمۆزە** (کرما.، هەورا.): ژەنگەسوورە، سیرەمۆزە.

**سوورەواڵە** (ئەردە.): داڵی سوور.

**سوورە و بووگ:** سووربۆوەوە.

**سوورەوەبوون:** سووربوونەوە.

**سوورەوەکردن:** سوورکردنەوە.

**سوورەوەکریاگ:** گۆشتی سوورکراوەوە.

**سوورەهەڕاڵە** (هەورا.): گوڵێکی بۆنخۆشە پتر لە نێو چیایاندا دەڕسکێ.

**سووریاش:** گزیر.

**سووریاو:** چتێکە ڕەنگی سوورکرابێ.

**سووربەسوور:** ووتەیێکە، ووتنی چتێک بەبێ پەردە بە یەکێک نیشاندەدات. ــ دووواندم.

**سووربلەتی:** گوێژەسوورە.

**سووربۆرە:** سوورێکە تێکەڵاوی سپی بێ، بۆ وولاخانە. سوورکەوە.

**سووربۆز:** سوورێکە بە بۆزی بنوێنێ.

**سووربوونەوە:** سوور هەڵگەڕانی مەردوم لەکاتی تەریقی یا توورەبوونێدا. سوورهەڵگەڕانی ئاسن لە کوورەدا یا گۆشت و چتێتر لەڕۆنی داخدا.

**سووربرتۆڵ:** چتی سووری ناشیرین.

**سووربیز** (هەورا.): زەردەواڵە، ژەنگەسوورە.

**سوورت:** شێوە، وێنە، درووشم.

**سوورتک** (کە.): بێ ئابڕوو، بێشەرم. ــ ی: بێ ئابڕوویی، بێشەرمی.

**سوورچک:** سوورێنچک.

**سوورچی:** خێڵێکی زۆر گەورەی کوردە.

**سوورخن** (کە.): سوورخوون.

**سووڕخۆر** (کە.): گڕخۆر، زۆرگەڕ. ــ ی: گڕخواردن، گلخواردن.

**سووڕخواردن:** گڕخواردن، گەڕان، خولانەوە، سووڕانەوە، خولدان، گێلای، خولخواردن.

**سوورخون:** سوورێکە بەلای سپییەوە بنوێنێ سوورخن، سوورفل، ڕەنگی وولاخانە.

**سوورخوون** (هەر.): مەڕ، کاوڕ یا بەرخێکە سەر و لەشی زەردێکی وایە بەسووری بنوێنێ.

**سووردەش:** ناوی کێوێک و شارێکییە لەناوچەی سلێمانی.

**سوورداگەڕان:** سوورهەڵگەڕان.

**سوورداگەڕیان:** سووردادگەڕان.

**سووڕدان:** سەماکردن. هەڵسووڕاندن، چەرخاندن، گەڕان، شەلەین، خولخواردن، خولانەوە، پێچ خواردن، گەڕخواردن، گێنگڵە، چەرخدان، زڤڕان، خولدان، سەر ــ : سەرزڤڕینەک.

**سوور و سات:** خەرج و باجێکە ئاغا لە ژێردەستانی خۆی بستێنێ.

**سووڕسووڕانێ:** گەمەیەکی کوڕوکچانە.

**سوورسووره:** خلیسکی سەرسەهۆڵێ. ــ کی (فە.): خلیسک.

**سوورسووێ:** تیرەییێکی کوردانە لە کوردستانێدا.

**سوورشامی:** جوورە ترێیەکی سوورە گلووی لە سادانی گەورەترە.

**سوورهل** (هەورا.): شێ، سووریرتۆڵ، سوورهۆڵ.

**سوورک** (باد.): جوورنە. (باد.) مۆرانە.

**سوورکە:** جوورە مێوژێکی سوورە لە ترێ سپیکە دروستدەکرێ. برنجێکە، کە دەنکی سووری زۆر تێدابێ لەپێش کوتانیدا. شوێنێکە لە زەوی، کەسوور بێ و سەوزی تێدا نەبێ، برێتییە لەمناڵی وورده. منداڵی وورده.

**سوورکەڵە:** ئادەمی سووریاو.

**سوورکەڵە** (ئەردە.): سوورکەوە.

**سوورکەوە:** وولاخی کەوەی سووریاو، سوورکەووگ.

**سوورکەووگ** (ئەردە.): سوورکەووگ، سوورخون.

**سوورکردن:** پاک کردنەوەی دانەوێڵەیە لە خەرماناندا بە جوداکردنەوەی کایەکە.

**سوورکردنەوە:** دیزە و گۆزە و هەرچتێکی لە قورە سوور دروست بکرێ لە ناو گڵی دەنێن و ئاگری تێبەردەدەن تا سووربێتەوە. وەراست گیران، نەمدیو و دیو پێکردنی گۆشت و چتیتر لە ناو ڕۆنی داغدا تا سوور هەڵدەگەرێ.

**سوورکردنەوەی نان یا گۆشت:** باشبرژاندن، برشتکردن، (باک.) براشتن، برێژەوەدان، نەمدیو.

**سوورکردنەوەی ئەسن:** شاراندن.

**سوورکردنەوەی پشت:** پشت ڕاگرتن بەرووتی لەبەر ئاوری و دەست پێدا هێنانی لەسەرمان، سوور دەبێتەوە.

**سوورگە:** سوورانگە.

**سوورگوم:** چتی وونی بێسەروشوێن. ــ کردن: بێسەرو شوێن کردن.

**سوورگی:** ئاسنێکی زمانەدارە لە دیوی ناوەوەی دەرگار پەنجەرەی پێ قایم دەکرێ.

**سوورلە** (هەورا.): سوورێژە.

**سوورم** (باک.): گیایەکە، سیردم. (ئەردە.) زەوی سووری بێ گژوگیا، سوورک، سۆرک.

**سوورمان:** واق وورمان، شاش بوون، ماتبوون. ــ ی: سوورک، سۆرک، خاکی سوور.

**سوورمە:** سیم، سپی و زەرد هەیە شاڵ و شەپک و قتکێ چۆخ و عەبای پێدەنەخشێنن. کل، (هەورا.) کلێ، سرمە.

**سوورمەند** (دزە.): گڵەسوورە، خاکێکە گڵەکەی سووربێ، سوورەکەی بۆ شینایی باشە.

**سوورمس** (موک.): نەبڵەق، هەڵمساو، سوورهەڵگەڕاو.

**سوورمێ:** نێوی ئافرەتانە.

**سوورناتک** (جا.): بۆری خواردنێیە، ئەو لوولەسوورەیە، کە لەنێو ریخۆڵانەوە گەیشتۆتە ناو گەروو ئاوی پێدا دەچێتە خووارەوە، سوورێنچک. (خۆ.) زوورلانک، (هەو.، بابا.) زوورناتک، (ڕەوا.)

سوورناسک، گیایەکی زەرد و گچکەیە گوڵسوور و ووردە و پەلکیشی بە سووری دەڕوانێ و ووردە باڵێک بڵند دەبێ ماڵاتی نێو چاوان سپی بیخوا یا وەلاتی کەوی نێوچاوانی شەقارشەقار دەبێ لەبەر قایمی لەنێو لانکێی دادەنێن ناڕزێ و میز و پیسایی بۆگەنی ناکەن و ئەسپێ و پندیشی تخوون ناکەوێ.

**سوورناسک** (ڕەوا.): سوورناتک.

**سوورنەخۆش:** مرێیەکە جۆشی سووردەرکا.

**سوورووپشت:** دەروپشت، چواردەورە.

**سوور و سەپان:** بۆ ئافرەتی جووان و جحێڵ بەکاردەبرێ.

**سوور و سنج** (هەورا.، سل.): سوورهول.

**سوورۆنە:** گیایەکی کوردستانییە، کەسەری دەرهێنا وەکوو چنگی کەوێ سوورە.

**سوورهەڵگەڕان:** سوور بوونەوەی مەردوم لە ڕقان یا لەبەر تەریق بوونەوە یان لە سەرمان، ئاڵ و بۆڵبوونی ترێ و هەندێ بەری تر.

**سوورهول:** چارەشڵ، ڕەنگی سوور، سوورەڕەنگ، شڵی سووری پەرزۆڵ، سورخون، دەم و چاو سووری ناشیرین.

**سووری:** (؟).

**سوورێتی:** سۆراهی، سووری چت.

**سوورێجە:** سوورێژە.

**سوورێچکە** (ئەردە.): قورگ.

**سوورێژە:** (هەو.) سۆریکە، سۆرک، (کۆ.) سۆرکە، هەشینۆک، سوورلە، سوورلێ، سوورینجە، نەخۆشییێکی تایبەتی منداڵانە دانەدانەی سووری لەلەشی پەیدادەبێ و بێ ئاوە.

**سوورێکە:** سورێژە.

**سوورێنە:** لوولەیەکە لە قوڕگی گیانداراندا ئاوی پێدا دەچێتە خووارەوە، سووریچکە.

**سوورێنجە:** سوورێژە.

**سوورێنچک:** سوورێنە، سوورچک.

**سووریان:** ناوی نەتەوەیەکی کۆنە لە پێشدا لە نێوانی سووریە و عێراقێدا بوون بەلاێ ئیمرۆ بلاوبوونەوە پایتەختی وان یا ئایینی پەرستیان شاری(حمص) یە لە وولاتی مەش سووریان پەیدادەبن پێیان دەڵێن، (یماقبةالاکراد) یا قەومی کورد بەلاێ زمانیان سووریانییە.

**سوورێنچکە:** (باک.) ئووربەلیشک، (ڕەوا.) سۆریشک، (کۆ.) ترتژک، (ڕژ.) سوورچک، (کۆ.) سیرۆچکە، سوورینچک، بۆری خواردنێ و ئاوێیە.

**سووری** (باک.): توورەیی، زوویری. ــ بوون: سڵبوون. بوونی چت بەسوور.

**سووری ئاسمان:** سوورایی ئاسۆی ئاسمان.

**سووریلز** (ڕەوا.، خۆ.): گیایەکی لاسک سووری بەهارییە بە چێشتی لێدەنرێ.

**سووریان:** سووران. ــ ەوە: سوورانەوە، گەڕانەوە، خولخواردن، خولیانەوە.

**سووریە:** خاکی سووریە دەکەوێتە باشووری کوردستانی بندەستی ترکان لەسووریەدا نیوملیۆن کوردهەیە. کوردستانی سووریە لەنزیکی دەجلە تا دەریای سپی بە کوردستانی ژێردەستی تورکانەوە گرێدراوە، ئێل، مالیات و باڤکی کورد پارچەپارچەبوون هەندێک لە ژووری سنوور و هەندێکیش لە ژێری سنووردن باب لە ژوور و کورِ لە ژێر بێجگە لەوانیش نزیکی ٥٠، ٦٠ هەزارکەس لەشام و حەلەب و حەما و تەلکەلرخ و حصن الاکراد و چیایێ علوی دادەنیشن گەلێک پیاوی ناوداریان لێهەڵکەوتووە لە کوردەکانی سووریە وەکوو: ماڵی زرکلی، ماڵی بەرمەدە، ماڵی هنانۆ، ماڵی بەرازیٔ، ماڵی عەبدورەحمان پاشا، ماڵی شەمدین ئاغا، ماڵی بەکداشی، ماڵی بۆزۆ لەمێژوودا بەناوی (أدیب معوض) کە بەناوی (الاکراد فی سوریه ولبنان) چاپکراوە و بڵاو پەخشکراوە.

**سووریچکە:** سورێنە، گەلوو، قرقرتۆک.

**سووریچیٚ** (هەورا.): سوورێژە.

**سووری سنجە** (مرک.): جوورە مارێکە.

**سووری کاڵ:** ئاڵ.

**سوورین:** بروانە: سورین.

**سوورینجە** (زەن.): سوورێژە.

**سوورینچک** (زاخ.): نێوگەڵ، ناوگەڵ. بۆری خواردنیٚ، (خۆ.) ترترۆک، (باک.) نووربەلیشک، تورتورۆک، بابەلیشک، سۆرسۆرک، سۆریشک.

**سووزان:** سووتان. ــ دن: سووتاندن.

**سووزانی** (هەورا.): سووزمانی، سۆزانی، قەحبک، حیز، جندە، بلّح، پۆڵ، قاحپە.

**سووزەنەک:** نەخۆشییێکی پەتۆ(ساری) یە لە رێگەی تێکەڵاوی دەگیرێتەوە میکرۆبەکەی (گۆنۆکۆک) ە چڵک لە چووی مرۆی دێتە دەریٚ و دەسووتێتەوە، کە زوو چارە نەکریٚ لەوانەیە مێزی بگیریٚ مێزدان و گورچیلکەی باوسیٚ و هەم لەوانەشە منداڵیشی نەبیٚ، لە ئافرەتانیشدا منداڵدانی تێکدەدا یا ئاووس نابیٚ یان بەرداویٚ چرکی وی وەچاو بکەویٚ کوێری دەکا دەبی چتی وا بخوا، کە مێزی زۆر پێبکات و بە ئاودووزەکی پرمەنگەنات و پوتاس یەک لە ١٠٠٠ دەشۆری و پەنسیلین لێدەدریٚ چارەی لە کوردستاندا وادەکەن: باینجانی پیشاوی لە چووی دەگرن، شۆرە ١مسقال، ئاوی کولاّویٚ ١٢٠مسقال دووای کولاّندنیان بەشیرە و گەرمی پێی دەشۆن ئاوی جۆ بۆ سووزەنەک زۆرباشە کەرەوزیش زۆرباشە، بنێشتە تاڵ و نۆک و زەردەچێوە بەقەد یەکتری بکوترێن بەلاّن بنێشتە تاڵەکە بەقەد مازوورێکی لە ئاردی زەردەچێوە و نۆکەکەوە دەدریٚ بەیانیان لە خورێنی قووت بدریٚ زۆرباشە.

**سووزەنی:** دۆشەگەڵەیەکی جوانی پرتەربیی ساچاخدارە لە گەرماواندا خۆی لەسەر پۆشتە دەکرێتەوە.

**سووزەنی سەرباز** (کە.): جوورە تفەنگێکی کۆنە.

**سووزمانی:** سۆزانی، (هەورا.) سووزانی، ژنی حیز، قاحپە، بۆڵ، بلّح، جندە، قەحبک، خووارۆ، قەڵپ.

**سووزمە:** چێشتێکە، کەبەرەکەی سووزیا و کوشرابیٚ و تلّپەکەی فریٚ درابیٚ. پارزن، پلاّوپارزن، پلاّوپەز، پلاّوپالّێو، پلاّوپارێن قابێکی مسی کونکونە بۆ پالاّوتنی چتی بەکاردەبریٚ.

**سووزن:** سووژن.

**سووزن ئاژن:** سووژئاژن.

**سووزنە:** سووتێن.

**سووزندان:** سووژندان.

**سووزنەک** (هەورا.): سووزەنەک.

**سووزەنی:** خاولی و پشتەماڵی گەرماوییە.

**سووزیان:** گری دەروون، سووزیانم دەگەریٚ واتە گری سەندووە.

**سووزیلو:** سووتاو.

**سووژن:** گونەدووش، گنەدووش، کونەووش، کونەووژ، کنەوژ، گۆچەوەنی، جەوالدروو، جەوالدوور، سووزن، ئاسنێکی ئەستوور و درێژکۆلەیە سەرێکی تیژ و سەرەکەی تری کونە بەرەو کورتان و گونیە و تەلیسی پیٚ دەدروون.

**سووژن ئاژن:** بەزۆری سووژنی لە چتێکی راکردن، سووژنکاری، بەسووژن بندداني چارەویٚ دانەوەکە(کام)ی کردبیٚ واتە دەدانی کۆڵ بوویٚ خواردنی پیٚ نەخوریٚ بەوکردەوەیە چاک دەبێتەوە و دانیش دەخوا.

**سووژندان:** چەرمێکی درێژکۆلەیە سووژنی تێدەخریٚ.

**سووژیان:** سووتان.

**سووژیلو:** سووتاو.

**سووس:** ناوی گیایەکی تاڵ و شیرینە ئاوەکەی دەفرۆشن.

**سووسە:** دەنگ و باسێکە هێشتا بلاّو نەبووبێتەوە. ــ یەک هەیە لەبابەت فیسارەباسەوە: دەنگ و باسێکی کزی هەیە. (کە.) دەلاقە، کولانە، رۆچنە، شووێنەوار، شووێن. ــ برین: کولانەگرتن. بای سووک. هەست، سووسەر. شۆفاری.

**سووسەکردن:** شۆفاری کردن، هەست راگرتن، دەنگ و باس وەرگرتنی کەم لە چتێکی نهێنییەوە.

**سووسەڵی:** بزنی رەشی دەم و چاو سپی یا سوورە.

**سووسەمار:** چاو سپیک، بزن مژە، دیلمار، مارمارۆک، بزغژ، بزغژک، مارماریشۆک، کێزنگرک، گومگومۆک، سیسەمار.

**سووسەمبەر:** گیایەکی گەلاّپانی زۆر بۆنخۆشە. نێوی ئافرەتانە.

**سووسەن** (هەورا.): سووێسنە، جوورە گوڵێکی جوانی بۆنخۆشە، زۆر رەنگی هەیە. نێوی ئافرەتانە.

**سووستەم:** ناڤی نفشەک تفەنگی کەڤناریە، سیستەم، جوور، شێوە.

**سووسک** (باک.): سووسکە، سووێسکە. ــ ە: سووسک، (هەورا.) سووێسکە. (رەوا.) فەرخەکردن.

**سووسمار** (هەورا.): سووسەمار، دایکەمارانە.

**سووسن** (باد.): سووسەن، سووێسن، سووێسنە، گوڵێکی بەهاری و بۆنخۆشە وەکوو نێرگسی وایە چڵێکی رووتی بیٚ پەلکە لەسەرەوەی چڵەکەی گوڵێکی پەنبەیی دێنیٚ. نێوی ئافرەتانە.

**سووسووک** (هەر.): فیتوو.

**سووسی** (هەورا.): سووێسکە.

**سووش** (زا.): جوورە گیایەکی بۆنخۆشە.

**سووفی:** زانا، هۆشمەند.

**سووفیلە:** ئیمامی پسپسۆکییە، ئیمامی تەسبیحییە.

**سووق** (هەو.): زەق، چاو ـــ کردن: چاوزەق کردن.

**سووقان** (دەلو.): ئێسک.

**سووک**: بڵح، هەرزە، حیز. (فە.) عەزاداری، ماتەم. (کە.) حنچک، کرت. ـــ پێوەدان: کرت پێوەدان وەبەر چینچکان دان، بەر بە بەرەوەنان. دلسقک. هەرزە، بێ ئابڕوو، پیژپیژە، جرهن، وەینەک. سقک، واژی قورسە، ناسەنگین. ـــ ایەتی: سووکی، سووکێتی.

**سووکە** (ئەردە.): چتێکە گوڕەوی پێ دەچنرێ، دەرزی گۆرەوییان، تەبنە. (باک.) شاپڵیتە.

**سووکەتی**: سووکێتی، سووکایەتی.

**سووکەی دووخ**: سووژنی دووک.

**سووکەڵە**: چتێکەلەهەڵگرتنیدا سووکبێ.

**سووکبار**: باری سووک، بریتییە لە کەسێک، کە ئەرکی سووک و کەمبێ. ـــ ی: کەم ئەرکی.

**سووکبوون**: قورسایی نەمان. هەرزەبوون، لەبەرچاوان کەوتن.

**سووکدەس**: دەست سووک. ـــ ی: دەست سووکی.

**سووکرە** (باک.): مەنجەڵ، دیزە.

**سووکرووح**: ڕووحسووک.

**سووک کردن**: قورسایی و سەنگینی نەهێشتن. ئابڕووبردن، لەبەرچاوان خستن.

**سووکێتی**: سووکی چتێک لەبابەت کێشەوە.

**سووکی**: بێڕەنجی، سانایی. کەمکێشی، سقکی مەبەس لەوچتەیە، کەقورس نەبێ. بێ ئابڕوویی، جرهنی، حیزی، بێشەرمی، حیزەبخۆیی، هەرزەیی، بەدناوی.

**سوول** (باد.): جورنە، تاقگە، پلووسکی ئاو. (فە.) سمێڵ. جار، نۆبە، کەرەت، هەل. (بڵ.) سوولاف، پرژ.

**سووڵ** (فە.): سوێر.

**سوولاش** (پیرا.): دژلاش.

**سوولاف**: سوول، ڕێژاو، تاقگە. نێوی ئافرەتانە.

**سوولان**: گوندێکە لەهێلا کەڤنە بازارێ هەسکیفێیە.

**سوولاوکە**: سوولاوک.

**سوولاووک**: پلووسک، بۆختک، (باک.) چرک، چرۆنەک، سوولاوکە.

**سوولە** (باک.): لاسکی توو تنییە. چوکڵەدارێکی تیژە، تەونکەران بەکاری دەبەن. چەند سینگێکی باریکی نووک تیژە بەرماڵی دەواری لە دەواریدا پێ قایم دەکرێ. لاسکی هەرزنی.

**سوولەرمە** (بڵ.): چلوورە.

**سولەیمانی**: سلێمانی شارێکی کوردستانە ماوەیەکی زۆر پایتەختی پادشایەکانی بابان بووە.

**سوولک**: مناڵی ساوا. (دەر.) سوولاوک.

**سوولکە**: مەبەس لە منداڵە: دووسوولکەم هەیە: دوو منداڵم هەیە. بنیسکە سابوون، شوێنی لیژ.

**سووڵکە**: شوێنی لیژ.

**سوولی** (بار.): گڕی ئاوورێ، گوڕی. پلووسک. تاقگە، ڕێژگە، (هەورا.) وەزەن.

**سوولی کەبد**: جەرگ و دڵی برژاو.

**سولێمان** (بار.، کە.): ترێیەکی ڕەشی گلوودرێژە.

**سوولین** (باد.): زێراب.

**سوولینە** (باد.): گۆزنگە ئەو لوولە گڵێنانەیە، کە سوور دەکرانەوە و بۆجۆگەی ئاوی لە ژێر خاک بەرێژە دەنران.

**سوومان** (باد.): ڕوخسار، ڕوو.

**سوون** (فە.): ئەستوندەی ڕەشمالان، ستوون. (زەن.، هەورا.، کە.، هەر.) سن. سووین، ساین، سوونەوەی تیغی، ساوین.

**سوونەت**: هەوەڵ ڕۆژی دروێنەیە. ـــ کردن: پێستە زیادەکەی سەرچووی منداڵی نێرینە بڕین.

**سوونەوە**: هەڵگلۆفتن و ـــ ی کەشک. (فە.) وولای، سووانەوە، هێسین، تیژکردن، هێسوون، هەسوون، سووین، سو، سوونەوە و وەرگێڕانی لباد و ئیتر، هۆسین.

**سونبول**: گیایەکی بۆنخۆشی گوڵشینە پەلکی وەکوو هی نێرگزییە و هێندەی ویش بڵند دەبێ.

**سووند** (باک.): سوێند، پاکانە. ـــ اڤر: سوێندی درۆ. ـــ خوارن: سوێندخواردن.

**سوونکە**: بنیسکەسابوون.

**سوونگەر** (باک.): هەور، ئیسفەنج.

**سوونگەرا** (باک.): هەوور، سوونگەر.

**سوونی** (هەورا.): سن.

**سووری** (باک.): سقووری.

**سووهران**: لەسەدەی چاردەمینێدا ناوبانگی پێشوویان سەهریە بوو دانیشتووی شەقلابات و تلهەفتوون بوون ئێستا بەرزای شنۆیە ناودەبرێن.

**سووێ**: تەماشا. دڵویستن، حەیف، سوو، جەخار، جخار، پەرۆش، داخ، حەجمەت، خەم، هەژمەت، تاوان، بەزەیی، خەفەت، ئێش، ئازار، ئەم برینە بە سوێیە: بەئازارە. ـــ بوونەوە: بەزەیی پێداهاتن، لە ـــ یان نەمزانی چبکەم: لەتاوان نەمزانی چبکەم، سوێم بۆوە: حەیفامن لێتێ. ئاسێ، سوو. (دەر.) سیپەلاک، سیپەلک. گۆشە، کەنار.

**سوویار** (زا.): سووار. (باک.) قەشمەری، لاسا.

**سوویاگ** (ئەردە.): سوواو، سوواوەوە، سیویاگ، ساویاگ.

**سوویان**: سووان، ساریان.

**سوویە** (لور.): سیپەلات، سپڵ.

**سووێ بوونەوە**: مردن لە داخان یا لەبەر ئازارێکی.

**سووێتەلی**: مرۆی هەڵشەی سەرسەری.

**سووێجگەر**: سیی و جیگەر.

**سووێر**: (هەورا.) سۆڵە، (فە.) سووڵ، (دەر.، هەو.، کە.، لک.) سوور، تیژ خوێ، زۆر سوێر، سۆڵ. (دەر.) شایی، زەماوەند. سەخت.

**سووێراووک**: شۆراووک، شۆراڤک.

**سووێرەک:** شارێکی کوردانە دەکەوێتە لای رۆژاوای دیاربەکرێ.

**سووێرەکە:** جوورە مازوویێکە دەباخی پێدەکرێ. (جا.) شیرێژی تەرە، کە هێشتا ووشک نەکرابێتەوە، جوورە خواردەمەنییەکە، کە لەخەستەی دۆی دروستدەکرێ.

**سووێرەلووک:** چتی سووێری ناخۆش.

**سووێرخووێ:** خواردنێکە مەزەکەی سووێربێ.

**سووێردەرمان:**

**سووێروو** (ئەردە.): ڕیشۆڵە، گاوانی.پەڕ، بیتوویێن، (موک.) جەلەبە، ڕەقەی زۆرگەورە، کە لەناوێدا دەژی.

**سووێرێژک** (لو.): سوورێژە.

**سووێس:** تارمایی. گوڵێکی جوانی بۆنخۆشی کوێستانییە.

**سووێسنە:** گوڵێکی شین و سوورە گەڵای وەکوو پنگی وایە و بۆنی خۆشە لە تەرازاندا دەبێ، سۆسن گوڵێکی کوێستانییە.

**سووێسکە:** زرەکەو، سووسکە، سوویسکە، سوویسکە مەلێکە وەکوو کەوی وایە بەڵام ئەم گچکەترە و گۆشتی دەخورێ و خۆشە.

**سووێسکەیی:** جوورە هەڵپەڕینێکە.

**سووێسن:** نێوی ئافرەتانە. سووێسنە، (دەر.) سوون، گیایەکی گوڵشین و بۆنخۆشە.

**سووێسنە:** سووسەن، سووسن، گوڵسۆسن، گوڵێکی کێوی سپی و وەنەوشەییە. نێوی ئافرەتانیشە.

**سووێسنی:** هۆزێکی کوردە و دووتیرەییە، ١) بەراجی، ٢) مەلکەری لەنێوەرۆی ڕۆژهەڵاتی مەهاباتێدا دادەنیشن.

**سووێکە:** سووێسکە. (کۆ.) منداڵی ساوا.

**سووێگە:** ئاسوو، سوو.

**سووێل** (کە.، هەمە.، شو.): سمێڵ.

**سووێڵ:** سمێڵ.

**سووێن** (کە.): سووێند، پاکانە.

**سووێنە:** (هەورا.) کەشکەساو، دۆڵە، (هەو.) ئینجانە، وەکوو تەشتی وایە، بەڵان لە قوڕدروستدەکرێ و سووردەکرێتەوە بۆ کاروباری ناوماڵ.

**سووێند:** درامەتی، کیس، (کە.) سووێن، (بابا.) سووێنک، (هەو.) سووند، سۆند، پاکانە بەناوی خووا. ــ ت بەتاڵبێ: نیشاڵەکە، کەسێکی سووێند بخووا و یەکێکی تر، کە بیەوێ بڵێ سووێندت بەتاڵبێ دەڵێ: نیشاڵەکە.

**سووێندخۆر:** پاکانەکار، دووکەس یا پترن، کە پاکانە بۆیەکتری بکەن لە چتێکی هاوپەیمان دابووبن.

**سووێندخوار:** پاکانەکار. ــ ی: پاکانە کردن، کیس خواردن، یەکێتی دووکەس یا پتر بە هۆی سوێندخواردنەوە.

**سووێندخواردن:** پاکانە کردن، کیس خواردن بەناوی خودا.

**سووێندخۆری:** پاکانە کردن، کیس خواردن. هاوپەیمانی.

**سووێنددان:** پاکانەپێکردن بەیەکێک.

**سووێندگیر:** خواگیر، کەسێکە، کە سووێندی درۆ پێی نووواندبێ.

**سووێنکە:** سونکە.

**سووێنگ:** سووێند.

**سووێنگخۆر:** سووێندخۆر.

**سووێنگخووار:** سووێندخۆر. ــ دن: سووێندخواردن. ــ ی: سووێندخوواری.

**سووێنگدان:** سووێنددان.

**سووبیجگەر:** سی و جگەر.

**سوونگگیر:** سووێندگیر.

**سووێر** (لور.): شایی، زەماوەند.

**سوویل** (لور.): سمێڵ.

**سوویلاف:** ئاڤگە، ئاو هەڵدێر. *

**سوویین:** سایین، سووان، سوونەوە، لێ هەڵسوون، تێ هەڵسوون، لێخشاندن، پێداخشاندن، لێسوون، ساوین، ساوون.

**سوویینەوە:** سووانەوەی تیغ.

**سوویێنە:** دەفرێکی گڵینەیە کەل و پەلی چڵکنی تێدا دەشۆن.

**سە** (باک.): سێبەر. (باک) سی (٣٠). ــ ا: سێبەر.

**سەهەند** (باک.): کەناری نوشتاوەوە.

**سەر** (باک.): زڕ، بەیار، بێ بەروبۆ، نەچێنراو.

**سەرە** (باک.): ئالای چکۆڵە. (باک) سەرک.

**سەرک** (باک.): ئالای چکۆڵە، سەرە، نیشانگای تفەنگ.

**سەک** (هەکا.، باک.): سرکە، ترشێکی زۆر ترش.

**سەناف** (باک.): چەتر، سەیوانی هاوینی.

سەناف

**سەوورۆک** (باک.): مانگ، (٣٠ڕۆژ).

**سێ:** یەرێ (٣)، سسێ، ناوە بۆ ژمارەیێکی لە نێوانی دوو و چوواریدایە. حۆقە، دووکیلۆ. نیو ــ: کراس، یەک کیلۆ.

**سێبارە:** سێپەندە، سێبەرانبەر ووتنەوەی کارێک یا کردنەوەی کارێک دەگەیەنێ بۆ جاری سێیەم. ــ پات: ووتە یا کردەوەیە، کە سێ جاران کرابێ یا ووترابێ. سێجاران پاتەکردنەوە، سێجارە.

**سێباز:** (هەو.) سێبازانێ، کەوشەکێن، گەمەیەکە. (هەو.) ــ انێ: سێباز، جوورە یارییەکە سێجار و سێبازی تێدا نەبرێ.

**سێبەدوولایی:** بەن یا گوریس سێ بە دوولایی دەکرێت.

**سێبەر:** سێجار، سێقات، سێرو. (هەورا.) سای، سەی. سەهین، چۆلک، سایە، نیسێ، سیە، (باک.) سە، سها، سێبەر، ساگات، (کە.) ساییک، سێوەر، جوورە تارماییێکە، کەپەیدادەبێ بە قەبارەیێک، کەبەری ڕووناکی بگرێت. ــ دار: سایەدار. ــ داری: سایەداری. ــ کردن: سێبەرکردن.

**سێبەردە:** سێ تەلاقە، دارا سێ بەردەی فڕێدا واتە سێ تەلاقەی خوارد. سێکوچکە.

**سێبەرۆ:** (شا.) سێرۆ، سێوەرۆ، جوورە نۆبەتێیەکە هەر بە سێ ڕۆژان جارێکی دەیگرێ.

**سێبەرێ:** ناوی ژنێکییە. چیرۆکی سێبەرێ و خەسووی ناودارە.

**سێبەلگووک** (باک.): جوورە گیایەکە.

**سێبەندە:** نێوانی هەردووسمت و سوورەغەی پشتییە. ــ ی پشتی.

**سێبەندی:** لۆتی.

**سێبەهران** (باک.): بەزۆر و زەوەندی.

**سێسکە** (باک.، هەو.): گیایە گەڵای وورد و درێژە گوڵی مۆرە وەهی گلێخەی دەچێ بۆ چێشتێ دەستەدا، سێبسکۆک، گێلاخە، سێبسکۆڵە.

**سێسکۆک:** سێبسکە.

**سێسکۆڵە** (شن.، هەو.، دەر.): گووێ بە گووارە، گێلاخە.

**سێ بنەهەرد:** سێوی بنەهەردی.

**سێپ** (زا.): دەستەندووی جووتییە.

**سێپا:** سێپک، سێداری بەیەکەوە بەستراوون مەشکەی پێدەژەنرێت. سێپەک، سێپێ، سێپها، خەچەرک، (باک.) دوستان، (هەورا.) سێکوچکە، ئاسنێکی سێ پێیە لەسەر ئاووری دادەنرێ و مەنجەڵی دەخرێتەسەر، سێپای مەشکە، سێپێک.

**سێپایە:** ـ ی وێنەگەرێتی. سێپا.

**سێپالوو:** سێسووچ، جوورە درکێکی سێسووچە، بۆ هەموو چتێکی سێسووچ دەبێ، سێلک.

**سێپەرە:** مرازێکی دارتاشییە داری پێ کوندەکرێ. ئەوەی بە تۆوبکرێ پێی دەڵێن وێنجە پاشەوەر. جوورە گیایەکە وە (شەوەر) ی دەچێ، سێ پەڕی لووسی گەڵاخرە، لەهەندێ جێگا دەچێنرێ و دووسێجار دەرووێتەوە دەیکەنە گزرە بۆ ئاژاڵان. جوورە بەفرێکی سێپەڕەیە. جوورە خووسێکە.

**سێپەک** (باک.): سێپێ، سێپای مەشکەیە.

**سێپەل:** رووەکێکە، کەتازە سەری دەرهێنابێ.

**سێپەلە** (کە.): برکەی کاڵەک و شووتییە، کە پەلداوێ.

**سێپەلچەرمگ** (ئەردە.): ئەسپێکە سێ پێی سپی بێ.

**سێپەیدا:** سێزاگ، سێ گەوهەر، سێ منداڵ.

**سێپرووسنەک** (دەر.): پەرەسلێرکە.

**سێپک:** سێپایەکە مەشکەی پێدا هەڵدەواسرێ بۆ ژەندن.

**سێپۆلکە:** گیایەکە.

**سێپێ:** سێپا، (باک.) خەخدەک. سێپایە، سێپای سەر ئاووری.

**سێپێک:** سێپای مەشکە.

**سێپێ یی:** کەلەهەموو قوونەیەکا دووجار دەچێتە پێشەوە و جارێکیش دەچێتە پاشەوە، جوورە هەڵپەڕینێکە، سێگاڤی.

**سێپێک:** جوورە کەپرێکە بۆ هەر ستوونەی ٣داری دەوێ، کەدەکاتە ١٢دار و هەرسێ دارەی لە جێگای پایەیەکی بڵاو دادەمەزرێت تا کەپرەکە قایم بێت.

**سێپێ** (باک.): سێپا.

**سێتا:** بەن یا گوریسێکە سێ لۆ بادرابێ، سێپەند، ئەزێ مافێ خووە ـ لتەدەستێنم، وەریسی من سێتایە: سێ لۆیە.

**سێتار:** مرازێکی بەزم و ئاهەنگە.

**سێتاڤ** (باد.): هەتاو.

**سێتە** (ئەردە.): دەزوو، فرێت.

**سێتەبەسەر:** ناوە بۆ تیرەیەک لە هەمەوەند، کە سێتە دەبەستن بەسەریانەوە.

**سێتلک** (باک.): چەنگاڵ.

سێتلک

**سێتۆ:** رووکێش، پووڵی ساختە و قەڵب.

**سێتیر:** جوورە تفەنگێکە.

**سێجۆرە:** سێچەشن.

**سێجرتەکی:** سێمرەکی، جوورە دارێکە.

**سێچار** (باک.): سێچووارجار: بارام ـ هاتە ماڵی ئێمە.

**سێچاک** (بەخ.): کەوا، کورتەک.

**سێچکە:** یەکێکە لە بەرەکانی دارەمازووبەقەد گزگلی دەبێ، ماچیچۆک (بار.) ماچیچکۆک، چلچلە بەلام چلەکانی کوڵن، سیچک.

**سێچکەسلاوە** (بابا.): باپشکێو.

**سێچوکلە:** چتێکە سێ ددانەی ببێ تیپی س ـ ش.

**سێچووار:** ناوە بۆ دووازدە رۆژەی دووای سێ شەش.

**سێچاچە** (ئەردە.): سێپالوو، سێ لێخە.

**سێخ:** سیخ، شیشەی کەبابی.

**سێخەت** (هەو.): مرازێکی دارتاشییە شووێنی جغزی پەروازی وێنە و ئیتری پێدەکێشرێ.

**سێخچە:** درک، دروو. ـ ی گەنم: چقل و پرزی گوڵەگەنمی، داسس، داسوولە.

**سیخجوولە** (لو.): سیخور.

**سێدارە:** لە ـ دان، لەداردان، خنکاندن، بەداراداکردن، سێپای مرۆ پێخنکاندنێ. وەکوو سێدارەوایە باز و باڵندەی تری لەسەردەنیشێ.

**سێدەر:** هەیوانێکە دیوارەکانی لەسەرستوونانە وادیارە سێدەرک یا سێ پەنجەرەی تێدابووە. ناوی ئەشکەوتێکییە لەرۆژەلاتی باژێری کەڤنە باژارییە. ـ ی: ژوورێکە سێ پەنجەرەی لە ڕێزی یەکەوە تێدابێ.

**سیدەنگ** (باک.): بۆری شێپووری.

**سێدانکە** (خۆ.): پێکوڵ، (رۆژ.، هەورا.) پەیکوڵ.

**سێدووری** (ئەردە.): سەخت.

**سێر:** دێزە، پەرەنگ، تۆخ. (فە.، هەورا.) تێر.

**سێران** (باک.): سەیران.

**سێرانگەه** (باک.): سەیرانگا.

**سێرە:** زیرە، سوورە، زوورە، گریان و هاوار.

**سێرە:** ئەندازە، نیشانە. ـ ی چەکان گرتن: نیشانەگرتن. گرێ و قیتکایەکەی سەر لوولەی تفەنگانە، کەسێرەی پێدەگیرێ. تەمەن، لە ـ ی تۆدا شەو رۆژ دەمخووێند.

**سیرە:** سەرنج.

**سێرەسێر** (ئەردە.): زیرەزیر، سۆرەسۆر، گریان، قیژە، قیژ و هاوار.

**سێرت:** سعێرت شارێکی کوردانە لە ژێردەستی تورکاندا لەبتلیسێ نزیکە مەلاخەلیل سێرتی هەستیار و زانایەکی گەورە و ناودارە زۆر نووسراوی بە نرخی بە زمانی عەرەبی داناوە (استعارەی) مەلاخەلیلی بەناوبانگە گەلێک پەرتووکیشی بەزمانی کوردی و کرمانجی داناوە بەناوی (نهج الانام) و چاپیش کراوە.

**سێرزکان** (کە.): گەمەیەکی دووکەسییە ٣ بەردان لە نێو شەش خانەاندا دادەنرێن خانە بەتاڵەکانیش دەمێننەوە بۆیاری کردن و لێکبردنەوە.

**سێرفی** (ئەردە.): دەست بڵاوی.

**سێرکۆو** (سوور.): سەرگوریلک، گووفەک.

**سێرمەکی**: سێمرەکی.

**سێرنج** (باک.): سارنج، ئەمبار.

**سێرۆ** (شا.): سێبەرز.

**سێرۆچکە**: قورقوراگە.

**سێرۆک**: خواردنێکە دووای سێ ڕۆژان، کە کەسێکیان لێ بری دەیدەن بە هەژاران.

**سێ ڕۆژە**: سێ ڕۆژگانە.

**سێرۆک**: ڕۆژوویکە سێ ڕۆژان لە شووێن یەکتری دەگرن.

**سێرۆژگانە**: خواردەمەنیەکە بەخێر بۆ مردوو دەکرێ دووای سێ ڕۆژ مردنی.

**سێرەمەلە**: باڵداسوکە، باڵندەیێکە ئێوارە و سبەینان پتر دەگەڕێ و ناتووانێ بنیشێ.

**سێروو**: ڕەشۆڵە، (هەو.) ڕیشۆڵە، سململ، باڵندەیێکە بەقەد کۆترێکییە بەڵان ڕەش و شین دەنووێنێ و کەوی دەکرێ، تۆقەڕەشکە.

**سێرووتەسەل**: تێرو تەسەل.

**سێرووژە** (باک.): برسی.

**سێرووژەیی** (باک.): برسێتی.

**سیروون** (باک.): جوورە چێشتێکە هەویری لە ڕۆنێدا دەتاوێننەوە ڕەنگە میوانی بێ.

**سێرووفی** (باک.): قەڵەو.

**سیری** (فە.): تێری.

**سێرپان** (باک.): سێرپیان، ڕێگایەکە سێ قۆڵی لێبوویێتەوە.

**سێرپیان**: سێرپان.

**سێرپێزکێن**: جوورە یاریەکە وەکوو دامە وایە.

**سێرپیزێن**: سێرپیزکێن.

**سێزاگ**: سێپەیدا.

**سێزدە**: سێنزە، سیانزە، سێ و دە ١٣.

**سێزدەمین**: سیانزەمین.

**سێزدەهەم**: سیانزەهەم.

**سێزدەهەمین**: سیانزەهەمین.

**سێزگەم** (باک.): گەسک.

سێزگەم

**سێزۆ** (ئەردە.): سۆزی.

**سێزوو**: سبەینێ.

**سێسەد**: ناوی گوندێکی کوردانە لەژێری ڕۆژاوای قامیشلوویە. سێجاران سەد.

**سێسەر**: سێپەند، بارام ترێی خووە سێسەر بەگەنم دەدا.

**سێسوو**: بڕەندێکی سێسووچە یا چتی سێسووچە. گیایەکی کێوی و دێمەکارە.

**سێسووچ**: سێگۆشە.

**سێ سێ**: سێکەس سێکەس، سێدانە، سێ سێ وەکوو دەڵێن چووار چووار، پێنج پێنج، یەکیەک، دوو دوو.

**سێسێخە** (ئەردە.): سێپاڵوو، سێ حاچە.

**سێ شەش**: ناوی هەژدە ڕۆژانە لەسەرەتای بەهارێدا، کە ٦ ڕۆژیایە و ٦یش بارانە و ٦ڕۆژیش هەتاوە یا ١٨ ڕۆژەی سەرەتای زستانییە بەو شێوەیە.

**سێشەم**: سێشەمە، سێشەمب.

**سێشەمە**: سێشەمە.

**سێشەممە**: سێشەمب، سێشەمە، سێشەموو.

**سێشەمب** (باد.): سێشەمە.

**سێشەمۆ**: سێشەمە.

**سێف**: ناوی دوودێیانە لە مەریوان. سێو.

**سێفەزەمینە** (کرما.): کرتۆپە، پارەڵماسی، گەڵێ جوورە خواردەمەنی لێ دروستدەکرێ.

**سێفەزەمینێ** (هەورا.): پارەڵماسی.

**سێفەلاسوورە**: سێوە لاسوورە.

**سێفەلۆکە**: گیایەکی بەهارییە گەڵاپانە بەرێکی شیرینی خڕی هەیە.

**سێفەلووکە**: گیایەکی بەهاری گەڵاپانە بەرێکی شیرینی خڕی هەیە.

**سێفتۆ** (زا.): چتێ بزگەن.

**سێفزەمین**: سێفەزەمین.

**سێفۆکە**: گیایەکە ئاژاڵ دەیخوا.

**سێفی** (هەورا.): پەتاتە، پارەڵماسی، کرتۆپە.

**سێڤ** (باد.): سێو، دارا ـــ ی: دارە سێو.

**سێڤابن ئاردی**: سێوی بن ئەردی.

**سێڤایی** (باک.): مەلە. ــ کرن: مەلەکردن.

**سێڤرشک** (باد.): سێوەکێویلە.

**سێڤۆک**: بەری گیایەکیە وەکوو سێوی شین و سوورن منداڵان لە چۆلی لێیدەکەنەوە و دەیخۆن، گیایەکە بۆ دەغڵ و دان باش نییە.

**سێڤێسێڤۆک**: پیازەخووگانە.

**سێڤک**: کۆتایی ئێسکێکی درێژە.

**سێڤکێت بن عەردی** (باد.): سێوی بن عاردی.

**سێڤکووری** (باک.): گیایەکە.

**سێڤۆک** (باد.): سێڤک.

**سێڤی**: ناوی نافرەتێکی زۆر جووان و هەڵکەوتوو بووە چیرۆکێکی لەسەر دانراوە ئەو چیرۆکەش هەربەوناوەیە.

**سێک** (باد.): سرکەی ترێ.

**سێکەرۆ**: ووشک و ڕەق، جوورە هەڵووچەیێکە لە پێشدا ووشک و کرمێیە لە دووایە هەر بۆ خۆی ساغ دەبێتەوە.

**سێکبەر** (موک.): سێ یەکبەر، وەرزێڕێکە پاش دەرچوونێک سێ یەکێکی دەدرێتێ.

**سێکبۆڵە** (هەورا.): گێلاخە، گیایەکە.

**سێکۆک**:سێپەڕە.

**سێبکۆک**: سێ پەڕە.

**سێکوژی** (باک.): سێسووچ.

**سێکۆ**: سێ کۆما، سێبەش.

**سێکوچک**: سێپای سەر ئاووری، (هەو.) گووچالە، (بابا.) سەرئاگرە. ـــ ە: سێکوچک، سێپایە یا سێبەرد لە نزیک یەکتری دادەنرێن و مەنجەڵ و دیزەوتاوە و چتی تریان لەسەردادەنرێت و ئاوریان لەبندا دەکرێتەوە بۆ گەرمکردنی زاد و ئاو و چتی تر، ـــ ی بەرد، کۆچک(دزە.) کووچانگر، (دەر.) گوچکانی.

**سێکووزە**: گیایەکی ئاوی سێ سووچە گەزێک لەمزەوی بەرزدەبێتەوە گوڵێکی تۆپ دەردەکات لەدەوری گوڵەکەی گەڵایەک دەردەکات وەک گەڵای کەوەر وایە.

**سێکوە** (باک.): جێگایەکە سێ دەرە و دۆڵان وێک بێنێتەوە.

**سێگا**: جوورە گۆرانییەکە، مەقامێکی کۆنی کوردییە.

**سێگاف**: ناوی جوورە گەمەیەکییە.

**سێگافی** (باک.): سێپێیی، جوورە هەڵپەڕینێکی کوردییە.

**سێگرمەکی**: سێپێیی لەهەڵپەڕینێدا. لە کار و فەرمانێکی بەتەواوی گەرم و سەرگەرم بوون.

**سێگۆشە**: سێسووچ، چتی سێسووچ.

**سێگوە** (باک.): سێسووچ، شەن.

**سێل**: ساج، (باک.) سێڵۆک.

**سێل** (باک.): ساج، خیز.

**سێلا**: سەخت، دژوار.

**سێلاخ** (زا.): لم، لیم.

**سێلاک** (باک.): (باک) سێلە، خیز، زیخ.

**سێلاڵە**: بڕوانە: سێلاڵە.

**سێلانە**: سێلۆ، سێلیزگ، سێتاڵ.

**سێلاو**: لێمشت، (باک) تیژاف، لەهی، (هەو.) لافاو، پووک.

**سێلە**: بڕوانە: سێلاک.

**سێڵە**: تەڵەبەردێکی پانە ئاشەوان کولێرەی ئاشی لەسەر دەبرژێنێ.

**سێڵر** (بل.): جڵە، ڕەقەی گەورە.

**سێڵچە**: سێ لچ، سێ لێو وەکوو وشتری، کە سێ لێوی هەیە.

**سێڵخان**: لمی ناو جۆگە و ئاوان.

**سێڵک** (کۆ.): دارێکە سەری سێ لکە و گیاوگوڵی پێ کۆدەکەنەوە و هەم بۆپێدەرهێنانی قرشە لەبنەوەی جۆخینان بەکاردەبرێ و پێی دەخرێتە بەرپێیان.

**سێڵکە**: نێرەکەر.

**سێڵگا**: شوورێنی لافاو.

**سێلمی**: جوورە هەڵوایەکە لەئارد و دۆشاو و پەنیری کوڵاو دروستدەکرێ.

**سێلم**: چیایەکە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕەوانـدزێ بەلای حاجی ئۆمەرانەوە.

**سێلنۆک** (باک.): ئاسانە، جێگای کەوشان، سێلوون.

**سێلۆقی**: سێبازد.

**سێلوولە**: لوولەوزنجیری ملی ژنان.

**سێڵە** (باک.): سێپەل، بەردێکی پانە ئاشەوانان لە جیاتی ساجی کولێرەی ئاشی پێ دەبرژێنن.

**سێلیف** (باک.): بڕوانە: سێلیو.

**سێ لێو**: سێ لێف، بەکەسێکی دەڵێن، کەگۆشتی لێوی لەژوورەوە زۆر ئەستوورە، کاتێکی باخوێ لێوەئەستوورەکەی دەبێتە دوو بەمرۆڤی وا دەڵێن سێلێف، سێلێو.

**سێلیزگ**: سێلانە، سێلۆ.

**سێمە** (باک.): جوورە گەمەیێکی منداڵانە.

**سێمەکووک** (باک.): جوورە بووزوورێکە.

**سێلەک** (باک.): (باک) خیز، سیلاخ، سێلک.

**سێلۆکە**: پارچەمرازێکی جەنجەڕییە.

**سەرەکی**: هەڵپەڕین، هەڵقوتین بە کوێ، بەجەخت.

**سێن**: ووتەیەکە بە دووای هەندێ ووتەی ترەوە دەنووسێ دەیکاتە ناوی بکەر: مەرسێن، حەقەوەسێن، بسێن: کڕیار.

**سێناف**: مرۆیەکە، کە گەلێک جاران ناوی خۆی دەگۆڕێ.

**سێنەر**: سێن، ئەستێنەر.

**سێنج** (باک.): پەرژینی باغ و باخچە بە دڕک و دارویار. ـــ کرن: بەستن.

**سێنزە** (هەورا.): سێزدە، سیانزە.

**سێنزەمین**: سیانزەمین.

**سێنزەهەم**: سیانزەهەم، سێزدەهەم.

**سێنزەهەمین**، سیانزەهەمین.

**سێنی** (باک.): مجۆعمە، سینی.

**سێنیک** (باد.): دەوری، دەفر.

**سێو**: (هەمە.) سێڤ، (هەورا.) ساوی، میوەیێکی خڕی گەورەی تێکوڵ جیری تام و بۆنخۆشە. (باک) زەرگەتە.

**سێوان** (باک.): سەیوان، چەتر.

**سێوانەک** (باک.): ووشترەوان.

**سێوەختە**: مەبەس لەبەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارانە؛ دارا ـــ نانی دەخوات.

**سێوەر**: سێبەر، نیسێ. نزار، نسار.

**سێوەڕە**: گیایەکە زۆر لەمزەوی جووێ نابێتەوە هەرلکەی سێ گەڵای پێوەیە، گوڵی خڕ و زەرد دێنێ، گیایەکی زۆرجووانە وەوێنجەی دەچێ، دەشخورێ، (باد) سێووک.

**سێوەرتاڵ**: سێبەرتاڵ، ئەوکەسەیە، کەئاکەوێتە بەر چاوی مرۆڤان و بۆ سووکی پێیدەڵێن ـــ یاسێوێ پیسک، ئاوارە.

**سێوەڕۆ**: سێبەڕۆ.

**سێوەرووچک** (خۆ.): سێوەڵووکە.

**سێوەرووک**: جووره بەرێکی دارەبەرووییە سپییە و دەخورێ وەکوو سێچکەی وایە.

**سێوزەمینە**: پەتاتە.

**سێوەکێویلە**: سێڤ رشک.

**سێوەلاسوورە**: قوولسێر، (کە.) سێڤەلاسوورە، جووره سێوێکە لایەکی سوورە.

**سێوەڵووکە**: (خۆ.) سێوەرووچک، گیایەکە بستێک پتر بڵنددەبێ و گەڵای وەهی تووی دەچێ و دانەدانە وەکوو قوماشی دانەدانە وایە نێرە و مێیەی هەیە، نێرەکەی نێرتکی دەردەکات و گوڵی سپی دێنێ وە گوڵی سۆڵە دەرەی دەچێ پەری وەکوو گونی مرزیە مێیەکەی وەکوو چەقالە وایە.

**سێوەنگ** (ئەردە.): سێبەندە، پەیوەست، سێبەند، پەیوەند. ـــ ی: سێوەنگ، سێبەندەی پشتی، پەیوەندی.

**سێودوو**: دوودڵی، نیگەرانی، دڵەباوەڕمەکە. ـــ کردن: دوودڵی کردن، نیگەرانی.

**سێوورسات**: خەرج و باج.

**سێولۆ** (گەردی باک.): گۆڕهەڵقەنە.

**سێووک** (باد.): سێوەرە، گیایەکی گوڵزەردە.

**سێووۆک**: چیایەکە کەوتۆتە رۆژهەڵاتی رەواندزێ.

**سێوول** (فە.): سمێڵ.

**سێوونگ**: سیاوون. ناوی دێیەکیشە لە شارباژێری.

**سێوهەرمێ**: جوورە هەرمێیەکی خڕە وەک سێو وایە.

**سێوێ**: نێوی ئافرەتانە. سێوی.

**سێوی** (باک.): هەتیو، کەسێکە دایکی و باوکی مردبێ.

**سێویاگ**: چتی سووراوەوە.

**سێویان**: سووران.

**سێوی بنچەنگ شەوتی**: هەتیوی بێ دایکە.

**سێوی بن ئەرزی**: گزەری، کرکرە، بنەرد، سێڤکێت بنهەردی.

**سێوی ترەک**: هەتیوی بێ بابە.

**سێویتی** (باک.): هەتیوی.

**سێهەم**: چتێکە لەپلەی ٣ دابێ، سێیەم. ـــ ین: سێیەمین.

**سێهیا** (باک.): سێپا.

**سێهەتی**: زاکان، سێ زاگە، سێ پەیدا.

**سێیان**: سێ (٣). ـــ: سێ سێ.

**سێ هێشە** (ئەردە.): ونار، زەوییەکە شێ درابێتەوە و چاندرابێ.

**سێیان**: سێدانە، سێکو.

**سێیەک**: یەک لەسێیان، بەشێک لەسێ بەشان، کە لەباتی مڵکانە خاوەند سامان لە کشتیاری دەستێنێ.

**سێیەک** (موک.): دووکیلۆ. لەسێ بەشان بەشێک.

**سێ یەکبەر**: ئەرکسەیە سێیەکی دەبا.

**سێ یەکبەری**: سێ یەک بردن.

**سێیەکی**: لەسێ بەشان بەشێک، سێ کۆیی، سێیەکی.

**سێیەم**: هی سێیەم، بەش، کەس یا چتی سێیەم، سێهەم.

**سێیەمین**: سێهەمین.

**سی** (باک.): سێبەر. نیسێ. (٣٠)، سێ جار دە، شەش جارپێنج دەکاتە سی، (باک.) سە، سیە. باڵندەیێکی بۆر و گەورەیە. پارچەگۆشتێکە گەورەی سپی واژە بەجەرگەوە نووساوە. (رەوا.) سیپەلک، سی و جگەر، سیپەلاک. (لو.) بۆ، لەبۆ، ئەرا.

**سیا** (لەک.): بەرز، بڵند. ـــ بالا: بالابەرز. (زا.، زەن.) رەش، بەختی سیایە: بەختی رەشە.

**سیابۆ**: گیایەکە دەخورێ.

**سیاتاڵە**: رەشتاڵە، بەدبەخت، سیاچردە. (ئەردە.) سیاچارە، چارەرەش.

**سیاچارە**: چارەرەش، بەدبەخت. ـــ یی: چارەرەشی، بەدبەختی.

**سیاچەردە**: سیا تاڵە، چارە رەش.

**سیاچەمانە**: گۆرانییێکی کۆنەی هەورامیانەیە.

**سیاچردە**: سیاچەردە.

**سیار** (ئەردە.): یارمەتیدەر، شاگرد. (ئەردە.) بەرزاییێکە لە نێوانی شووێنێکی نزم.

**سیارە**: جوورە گەنمێکە. نێوی دێیەکیە لە ناوچەی وامەوایە. ئەوبەشە، چوارچێوەی دەرگاوپەنجەرەیە، کەدەچێتە ناو دیوارەوە.

**سیارە**: نجم، رەوان.

**سیاریحان**: رێحانەکێویکە.

**سیازاخ** (کە.): کەرخنکێنە، گیایەکە بستێک بڵند و گوڵەکەی وەهی جۆی دەچێ بەتەری بۆ ئاژاڵان باشە بە ووشکی ناوێرێ بیخوا، برژانگەکانی لەچاوی هەڵدەچەقێ. گیایەکی بەهاری و کەم تەمەن و گەرمیانییە لە پێش هەموو گیایەک پێدەگا ووشک دەبێ وەکوو چەودەری وایە بەلام ئەم کەمگەلاو بالای کورتە و گوڵێکی پڕپڕی هەیە، (ئەردە.) زاج.

**سیازەندووق**: گیایەکی رەشپەڵگەراوی رەق و تەقە.

**سیازدە**: سیانزە. ـــ م: سێزدەم. ـــ مین: سێزدەمین.

**سیازوخاڵ**: بریتییە لەچتی زۆر رەش.

**سیاساڵ**: ووشکەساڵ. ـــ ی: ووشکەساڵی: لە رۆژگارێکی سیاساڵیدا دەستبلاوی مەکە.

**سیاسەت**: ئەتک شکان، ریسوایی. ـــ کردن: ریسواکردن. ـــ کراو: ریسوا. پەرساری، خاکداری، هەڵسووڕاندنی کاروباری وولات.

**سیاسەران**: دەروێشان.

**سیاق**: نووسینی ووشان بەخەتی درێژووکە.

**سیاقەلەم**: رەنگرێژی.

**سیاگۆش** (کە.): گۆڕهەڵقەنە.

**سیامار**: رەشمار، ماری رەش.

**سیامال** (کە.، هەورا.): رەشماڵ، دەوار، کووێن.

**سیامەد**: سیامەند چیرۆکەکەی ناودارە.

**سیامەند**: یەکێکە لە دووازدە بەندە گۆرانییە کۆنەکان. نێوی کورانە.

**سیان**: قوڕی پیسی نێوکووچانە، قوڕی ڕەش، (کە.) سیاناو. سێن، چت یا کەسی ژمێر راوە، مێوانەکان سیانن.

**سیانو** (کە.): قوڕەڕەشی نێوکۆڵانان.

**سیانە**: سێیان، سێیەمین، سێیەم.

**سیانزە**: ناوی ژمارەیەکی یەک لە نێوانی دوازدە و چاردەی دایە. ــ م: سێزدەم. ــ مین: چتێکە لە پایەی سێزدەدابێ. ــ هەم: سیانزەمین.

**سیانسیان**: سێ سێ.

**سیانکە**: قوڕ.

**سیاو** (هەورا.): ڕەش.

**سیاوا** (هەورا.): ڕەشەبا.

**سیاوناوی** (هەورا.): ناوی ڕەش.

**سیاوەش**: سیا، ڕەش.

**سیاوپەتا** (هەورا.): ڕەشەگرانەتا.

**سیاوپووزە**: گیایەکی لاسک ڕەشی ناوبیە گەڵایەکانی وەکوو هی کەرەوزین.

**سیاوچەمانەوێژ** (هەورا.): گۆرانیبێژ، مەقامبێژ. گۆرانی (سیاچەمانە) بێژ.

**سیاوسەدە** (هەورا.): سمڵ.

**سیاوڵە** (هەورا.): ڕەشکەی ناونان.

**سیاوڵەوچەمی** (هەورا.): ڕەشکێنەی چاو.

**سیاووا** (زەن.، هەورا.): ڕەشەبا.

**سیاوون** (کە.): بزنی ڕەش، بزن، گۆشتی بزن بێجگە لە بزنەمەڕەز. (کە.) ڕەش، هەرچێکی بێ.

**سیاوی** (هەورا.): ڕەشکێنەی چاوی. ــ توخ: ڕەشی تاریک.

**سیاوچەمی** (هەورا.): ڕەشکێنەی چاو.

**سیاهە** (ئەردە.): ڕیزەنووسراوێکە لەسەرباری درێژی، کەباسی تاکتاکە چتی فرۆشراو یا کڕاو بکات.

**سیاهی**: ڕووناکی چاوێکییە، کەلەبەر بێ هێزی بەدژواری چتی پێ ببینرێ. (ئەردە) سیاهە.

**سیایی**: ڕەشی، سیاهی.

**سیە** (فە.): ڕەش.

**سیەووشک**: جوورە نەخۆشییێکە بەهەندێ گیانداری دەگات و هەمیشە دەم و قوڕگی ووشک دەبێ.

**سیەم** (باک.): سێبەر.

**سیەهگەردە** (مەلیش.): ڕەشکێنە.

**سیەر**: سێبەر، نیسێ.

**سیپا**: سندووقی چای ووشک، ڕەبەت. (هەورا.) هەشارگەی ڕاوو نێتر بۆسەی شەڕێ.

**سیپارە**: قورئان، سی جزووی قورئانێ. نامیلکەی گچکە.

**سیپاڵ**: کەرت و پەرت، پەلاس، کەل و پەلی کۆن، پەڕۆ و لبادی کۆنە و چڵکن. بەکەسێکی دەڵێن، کەلە جێگایەکی دانیشت و زوو هەڵنەستێ و خەڵکی وەڕەزکات.

**سیپاڵ بەڕۆن** (هەورا.): هەرمێشک، کوللێرەی تازە و گەرم لە ناو ڕۆنی هەڵپشێوراو یا لە ناو ڕۆن و دۆشاوێدا هەڵکێشرابێ.

**سیپاڵ و ڕۆن**: سیپاڵ بەڕۆن.

**سیپان** (باک.): جێگایەکی ئەوتۆیە با بەفری لێ کۆبکاتەوە. (باک.) چیایەکی بڵند و ناوداره لەلای ڕۆژاوای گۆلی وانییە. سیپانێ خەلاتێ دبێژن سەری وی هەردەم بەفرلێدباری جێگای چیرۆکی سیامەند و خەجێیە گۆیا سیامەند و خەج لەو چیایەدا شادی و خۆشی بڕەشی گۆڕیوەتەوە، چیرۆکی وان تەنها ئەڤینداری نییە، بەلان فەلسەفەی قەدەرییە.

**سیپە**: ڕەبەت، پارچەناسنێکە بەسەرپشتی تفەنگەوە بۆ ئەنگاوتنی نیشانە بەرز و نزم دەکرێتەوە، جووان، لاو. (سوور.) دەرووت. (موک.، کە.) حەشارگە، حاشارگە، قۆختە، شاردنگە، وەشارگە، کەمین، بۆسە، پەنا، سەنگەر، ئەو دارەیە بەقەد لوولەی تفەنگەوەیە.

**سیپەکوور**: جوورە تفەنگێکە سیپەکەی کوورە.

**سیپەل** (باد.، باک.): شەپۆلی گەورە و بەهێزی قەڵپەزەی ئاوییە، کەبەسەر چتێکی بەرزدا بڕوات.

**سیپەلاک**: سیپەلک.

**سیپەلان** (باد.): بقە.

**سیپەلک**: سی، شووشوو، شووش، پیلاسپی، پشاسپی، (باک.) سەپەلیک، (دەر.) سووێ، (لو.) سوویە، هەناو، شش.

**سیپک** (باک.): دالان.

**سیپکا**: ئێلێکی کوردی ناودارە لە باکووری کوردستانی دادەنیشن ئەوانیش لە کوردستانی ژێردەستی تورکانە.

**سیپلک**: سیپەلاک.

**سیتاڤک** (باد.): سێبەری مرۆڤان.

**سیتە** (باد.): تەپکەی ڕاو.

**سیتک**: بەردەلان و تم تمان.*

**سیتکسەلاوە** (کە.): جووانکە، باپشکێو، سیچکەی سلاوە.

**سیتل** (باک.): سەتڵ، مەنجەڵی مسین.

**سیتلۆک** (باک.): سەتڵۆک.

**سیچک**: سێچکە.

**سیچکەسلاوە** (کۆ.): باپشکێو، برینێکی گچکەیە لە پێڵووی چاودێت زۆر بەئێش و ئازارە.

**سیحا**: گوندێکە دەکەوێتە ژووری ڕۆژهەڵاتی قامیشلو.

**سیخ** (هەورا.، باک.): شیشەی کەبابی و نێتر، سیخوار. ڕاست، قیت، ڕەپ و ڕاوەستاو. (بار.) ئەوچتە سپییەیە، کە لەهاوینزاندا بەسەر گیا و گوڕفەکانەوە دەبینرێن. قەلەمێکی سەرتیژ و باریکە لە داروئاسن دروستدەکرێت گەلێکجاران گۆڕا، تەنتە، کەنزا بەوی چێدەکەن.

**سیخ ناخن**: چتی سیخناخ، سیخاخن.

**سیخار**: سیغار، جغارە، جگەرە، پزیزۆک. سیخووار.

**سیخە**: قیمە. ــ کێشان: قیمەکێشان (بۆ گۆشت و نێتر).

**سیخەڕۆ** (خۆ.): بڕوانە: سیوەڕۆ.

**سیخەسیخ:** نیخەنیخ. بە ــ کارتەواوکردن: بەنیخەنیخ کارتەواوکردن.

**سیخەپر:** بێچووە باڵندەیێکە، کە هێشتا پەروباڵی دەرنەکردبێ.

**سیخچە** (ئەردە.): درِوو، درِک.

**سیخچەی گەنم:** داس، داسولە.

**سیخچوولە** (لو.): سیخورِ.

**سیخمە:** سینەپۆش، (باک.) بەربوودی، تووتک، ئێلەک، هێلەک، سوخمە، (باد.) زەخمە، سینگ پۆش.

**سیخن:** نەخۆش و زەرد و چرچ و لاواز و سیس.

**سیخناخ:** چتی پرِ ناخنراو. ــ بوون: پرِبوونی چتێک لە چتێکیتر. ــ کردن: پرِکردن و ناخنینی چتێک لە چتێکیتر.

**سیخووار:** ئەو تەرِاییە، کەلەسەر گیایان لە پاییزاندا بەیانیان دەیبەستێ، سیخ، (کۆ.) خوێز، خووس، خووسار، (مەرگە.) سیخار، زوقم.

**سیخورِ:** شۆفار. سیخووار، خووس، زوقم، (جا.) سووچەر. ڕیخۆڵەی نەستوور و لەورگ و پیسایییە، کە فرێدەدرێ، پیسایی وولاخ و ئاژاڵانە، سووچەر. داعبایەکەبەقەد گیسکێکییە وەکوو ژووژکییە چوارپێی هەیە قەڵەمداره و کلکی وەکوو دەسکە قامیشی وایە ئاوی تێدا دەبا بۆ فەرخەکانی و گۆشتی دەخورێ، کەرِقی هەستێ پەرەکانی دەهاوێ وەهەرکەسی بکەوێ بریندار دەکات.

**سیخورمە** (کۆ.): نقوورچک. ــ لێدان: نقوورچک لێدان.

**سیر:** گیایەکی کێوی و بەهارییە و دەخورێ و بۆنی ناخۆشە بنەکەی سەلکە وەکوو پیوازی بەتوو دەچیندرێ، سیرچەندجووری هەیە. ــ ە خاسە: کەمزۆرزۆرباشە. ــ ەسەگانە: سیرۆسەگ. ــ ەکلۆرە: لەشیرێژی دەکرێ. لەکوردستانێ دا (۱۲) مسقاڵە. (فە.) شایی و زەماوەند، کەیف و بەزم. ــ کردن: ژنهێنان.

**سیراج** (سوور. ،هەورا.): شیرێژ، ژاژی، دۆ ووشکە.

**سیرانجن:** سیرەنجن، برِێتییە لەچتێک کەمزۆر وورد چنرابێ.

**سیرە:** ووتەیێکە زەردەواڵەی پێ دەردەکرێ. (هەورا.) ژەنگە سوورە. (جا.) سیرەمۆزە. (کە.) نۆبە، نۆرە، سرە. تەمەن.

**سیرە:** جیرە جیری قایش وئیتر. دەنگی سەماوەرێکییە کەتازە هاتبێتە جۆش.

**سیرەبەند:** سیلەبەند.

**سیرەبۆگەنە:** سیرەسەگانە.

**سیرەت:** چووی نێرینان، کیر. بۆشێواز بەکار دەبرێت.

**سیرەخاسە:** سیرێکی هەرەباشە بۆ باداری و بێوەسیری لەگەڵ مێوژی سبەینان بخورێ لەخورێنی زۆر زۆرباشە.

**سیرەسەگ:** سیرەسەگانە.

**سیرەسەگانە:** (سوور.) سیرەسەگ. سیرەبۆگەنە، سیرۆسەگ. (سوو.) سسیرۆکەسەگانە.

**سیرەسیر:** دەنگی دەرگا و با و مار و قایشییە. سیرەی یەک لەدووای یەکتری، سیرەهۆرِ.

**سیرەکلۆرە:** جوورەسیرێکە.

**سیرەکۆ:** (هەورا.) بەردێکی پانی قورس و لووسە هێڵە ساوی پێدەکرێ.

**سیرەکۆڵێ:** (هەورا.) بەردێکی لووسە سەربان و چتی دی پێدەسوونەوە. بەردی لووس وسوواوەی نێوچۆمانە. کەمەر، سنێن.

**سیرەمۆزە:** زەرگەتە، جوورە زەردەواڵەیێکی زەردباوە، شەنگەسوورە.

**سیرەمۆک** (باک.): گیایەکی کێوییە.

**سیرەمۆکە:** سیرمۆکە. گیایەکی کێوییە.

**سیرەنجن** (سیرنەنجن): مەبەس لەچتێکە کە زۆر وورد کرابێ.

**سیردم** (باک.): گیایەکە.

**سیرفسک** (باد.): سیرەبۆگەنە.

**سیرک** (باد.): سیری ووردی شاخییەبۆپەنیرو ژاژی بەکاردەبرێ.

**سیرکە:** سیر.

**سیرکەسە:** گیایەکە بەمزەریدا پان دەبێتەوە گوڵەکەی دەنک دەنک وناشیرینە، کە بپسێنرێ ئاوەکەی دەکشێ.

سیرکە

**سیرکۆ:** دیبەگی برنج کوتانێیە.

**سیرکوت** (باک.): دەسکی دەسکاورنگێیە.

**سیرم** (باک.): سیرمە.

**سیرماست:** بەربەسێڵ.

**سیرمە:** (هەورا.) دوواڵ، تەسمە. (شکا. ، نەهـ.) دڤێل، دوهێل. (باک.) دڤێت، سیم، زۆل. سیرمە، وێژە، زوێل. بەندی چەرم، تیسماڵکێکی باریکی چەرمینە، چەرمی خاوی، زوێل زوێلە، وێژەی جووت.

**سیرمەکێش:** شیشێکی باریک ودرێژە، سیرمەی بنکی کلاشی پێ تێ هەڵدەکێشرێ.

**سیرمۆک:** سیرەمۆک.

**سیرمۆکە** (شار.): گیایەکی بەهارییە گەلای وەکوو گەلای سیروایە، (کۆ.) قوراده، بەلام بۆنی ئەم ناخۆش نییە، ئاژاڵ بیخوا شیرەکەی بۆگەن دەکات. سیرمەی باریک و چکۆلە.

**سیرمووک:** سیرمۆکە.

**سیروان:** نێوی پیاوانە. نێوی چۆمێکییە.

**سیرۆ:** چیرۆکی سیرۆپیفازۆ لە وولاتی ئێمەدا ناوداره بۆ منداڵانی دەگێرنەوە. باڵندەیێکی دەنگخۆشە.

**سیرۆچکە** (کۆ.): لەتینوان سپیلاک ووشکبوون. (کۆ.) لەسەرمان کورووژم هەڵاتن. سیرەخاسە. سر و کەسیرە بوون.

**سیرۆچلە:** وەکوو سیرو کەوەر کەژییە.

**سیرۆسەگ:** سیرەسەگانە، (سوور.) سیرەسەگ.

**سیرۆکە:** سیری کێوی بۆ شیرێژ باشە.

**سیروماست:** نانی ووردکراوە، کە رۆنی داغ و ماستی بەسەرداکرابێ.

**سیرێژ:** جوورە خواردەمەنییەکە وەک سووێرەکە بەلام ئەم خوێی تێدەکرێ، سیراج، دۆ ووشکە.

**سیزەن** (فە.): دەرزی دروومانێ.

**سیس:** بۆ هەموو چتێکی لاواز و بێکەیف لە گیاندار و درەخت و گژوگیا بەکاردەبرێ، سەوزایی و گیانداری لاواز و چرچەلە، چرچ، چورچ، لاواز، لەرِ، چەکاڵ، ژاکاو، ژاکیاگ، قرمچ، چورچەمەن، گەچراو. ــ بوون:

ژاکان، چزمرین، سیسیان، چرچبوون، ژاکیان. ـــ کردن: چرچکردن، ژاکاندن.

**سیسارک:** سیسارکەکەچەڵە.

**سیسارکەکەچەڵە:** سیسارگەچەڵە، (زمن.، دەر.) سەرگەڕ، سیسالک، (هەورا.) سیسەرگەکەچەڵە، (کە.) سەرگەڕ، (قەرە.) داڵەگەرگەڕ، باڵندەیێکی زەرد و بەڵەکە گۆشتی ناخورێ بەقەد بەرخێکی دەبێ لەنێو شاخاندا دەژی گەندە و کەلاک خۆرە و سەری بێ تووکە.

**سیسارگەکەچەڵە:** سیسارکەکەچەڵە.

**سیسالک** (باک.): سیسارکەکەچەڵە.

**سیسەبان:** گیایەکە لە گەرمێنێدا لە زستانێدا شین دەمێنێ. کێشە و هەرایەکە لە نێو دژڵ و دەربەندی سیسەبانێدا ڕوویداوە.

**سیسەرک** (فە.): سیسرکە.

**سیسەرگەکەچەڵە:** سیسارگ، سیسارکەکەچەڵە.

**سیسەڵە:** گیانداری سیس، دڕ، لاواز.

**سیسەمار:** سووسەمار. جوورە مارێکی زەردی ڕیوەڵەیە.

**سیسەمارە:** مەردومی سیس و لاواز.

**سیسەمەڕۆ:** سیس و چرچ.

**سیسەمرۆ:** سیسەمارە.

**سیسەنەک** (فە.): باپشکێو.

**سیسبوون:** چرچبوون.

**سیس پەست:** کردنی ئیشی ژن و مێردایەتی بە تێ ناخنینی بەسستی.

**سیسرە:** سیسرک، کریسک، تیرتیرک، (کە.، زمن.) سیسەرک، سیسرینگ، سیسرکە، (سوور.) کووسک. (ڕەوا.) کونێکی گچکەیە، کە ئاستەم بە ڕووناکی بدات.

**سیسرک:** سیسرە: داعبایەکی زەردی بچکۆلانەیە وەکوو کرمییە بە قەڵەمباز دەڕوا و زیان بەخشە.

**سیسرکە:** سیسرە.

**سیسرگ:** سیسرک.

**سیسرنۆک** (باک.): تەرزەی سووک.

**سیسعەمەر:** سیس عەنبەر.

**سیس عەنبەر:** گیایەکی سەوزی گەڵاپانی تاڵی بۆنخۆشە، سیسەنبەر، سووسەنبەر.

**سیسک** (باک.): تۆو، دان، ناگە، دەنک، چەقالە.

**سیسکە:** سیسەمار.

**سیسکەسەلام** (دەر.): باپشکێو.

**سیسۆڵە** (ئەردە.): سیسەڵە، لەڕ، لاواز.

**سیسووک:** داعبایەکی زەردی بچکۆلەی چنگ چنگی دەنگ زلە.

**سیسی:** بەری گەنگرە، کە بە تێر خوویی و برژاوی دەخورێ. ووتەیێکە هانەهانەی گەماڵی پێ دەدرێ بۆ پەڕینی لە دیڵ.

**سیسیان:** ژاکان، چرچبوون.

**سیسیک:** مرازی فیتولێدان.

**سیغار:** جغارە، (باک.) پزپزۆک. ـــ خۆر: جغارەکێش. ـــ خۆری: جغارەکێشی. ـــ کێش: سیغارخۆر. ـــ کێشان: سیغار خواردن.

**سێف:** سێو.

**سێفەترشە:** سێوی ترش.

**سێفۆکە:** گیایەکە وەکونجی دەچێ.

**سیڤانە** (باد.): گوورێسوانە.

**سیڤانۆک** (باد.): پاساری، سوواندۆکە، سیڤیانک.

**سیڤانۆک** (باک.): (باد.) سێڤۆک، دارێکە بەرەکەی وەکوو سێوی وایە و ناخورێ.

**سیڤلە** (زا.): جرج.

سیڤلە

**سیڤۆک** (باد.): شووێنێکی هەڵامساوە لە لەش، کە زەبرێکی وێکەوتبێ.

**سیڤیانک** (باد.): پاساری.

**سیق** (ڕەوا.): چیکڵدانە، خواردنـدان، ناشک، ناشکە. سووری سیپەلک، (ڕەوا.) چیکڵدانە، سیقەتۆرە، زیقەتۆرە، مرۆیەکێشە وەکوو سووری سیپەلکێ بێ.

**سیقەتۆرە:** زیقەتۆرە، چیکڵدانە پارچەگۆشتێکی بۆشە لەزگی ماڵداراندا خواردەمەنی تێدەچێ و لەوێوە دەچێتە ناو ڕیخۆڵەوە.

**سیقەدان:** جیقەتۆرە، چیکڵدانە، سیقەتۆرە.

**سیک** (هەورا.): ژەنین، لەکاتی پێداکردندا گۆڵسەگ، کەپاڵ پێوەدەنێ دەژەنێ. قنگ، قوون، پیزی، تریزە. بای قنگ.

**سیکارد:** جەخار، کێردی گەورە.

**سیکەتۆرە** (موک.): چیکڵدانە، سیقەتۆرە، چقەتۆرە، بەرچینۆک.

**سیکەسیک:** دەنگی مشکانە. دەنگی گۆڵە سەگیشە لە کاتی سووار بوونی مێیەکەیدا.

**سیکەنە و سەرخان:** ووتەیەکە بەکاردێنرێ لەکاتی زۆر ووتنەوەی قسەیەک یا زۆر کردنەوەی کارێکیدا؛ ئەیهۆ دیسان سیکەنە و سەرخانە.

**سیکۆن:** دەنگێکە لە کاتی خەنجەرلێداندا لێی دێ. ـــ ی لێهێنا.

**سیگار:** سیغار، جگەرە.

**سیل:** برۆانە: سیلەبەند. دەردەبارێکە، دیق.

**سیلاڵە** (کە.، هەو.): باڵندەیێکی گەورە و سپییە دەنگی مەیلەولاڵە.

**سیلاوی:** دیقدار.

**سیلاهی** (باک.): خانووی چکۆڵە. کیف.

**سیلایی:** سیلە.

**سیلە:** ڕەقە، گۆشە، کەنار، قەراغ. ـــ ی چاو: تیلەی چاو، تیلەک. ـــ کووچە: کەناری کووچە. (باک) پڕ. ـــ کردن: پڕکردن تا لێواری. (باک.) خیز، زیخ. (باک.) سەرسووچی کۆڵان.

**سیلەبەند** (باک.): سیرەبەند، بەرسینگە، سینەبەند، ئەوکەژوو، پەت و قایشەیە، کەبە بەرسینگی ووڵاخیدا ڕایەڵ دەکرێت بە گوڵنگەن.

**سیلدار:** دیقدار. ـــ ی: دیقداری.

**سیلمانک** (باک.): باز یا سەقری سپی.

**سیلکردن:** پاک کردنەوەی کاتژمێر و قاپ و قاچاخ لەژەنگ و چلک. سیل هەڵێنان و دیق کردن.

**سیلۆکە:** پارچەمرازێکی جەنجەرییە.

**سیم:** سیلک، تێل. بێ ـــ : لاسلکی. (باک.) سیرمە، سوورمە.

**سیما:** چارە، ڕوخسار، قەڵافەت، سیمان.

**سیماسای** (هەورا.): سیپەڵاک ئاوسان.

**سیماسین:** ڕقهەستان، ئاڵۆزبوون.

**سیماتک** (باک.): باڵندەییێکە.

**سیمان:** سیما.

**سیمەرخ:** سیمرخ.

**سیمەرەمەر:** (؟).

**سیمەک:** سیمەنسا، گوڵەیاسەمینە. سیمین، سەمەن سمنسا.

**سیمەنسا:** سمنسا، گوڵە یاسەمینە، سیمین، سەمەن.

**سیمبەند:** تەلبەند.

**سیمر:** سیمرخ.

**سیمرخ:** سیمرغ، سیمەرخ، باڵندەییێکە هەر ناوی هەیە و دەڵێن نەدیتراوە.

**سیمرغ:** سوورخورمە، نقوورچک. ـــ لێدان: نقوورچکلێدان.

**سیمکەشی:** (؟).

**سیمگڵ:** گڵێکی سووری بێژراوە لەگەڵ کای بێژراودا دەگیرێتەوە ناو ماڵی پێ سوواخدەدەن. (بابا.) گڵسوور، بەگڵێکی دەڵێن، کە سپی زەردباوە بەکای وورد بێ و سوواخی پێدەکرێ و بە سوواخەکەشی دەڵێن سیمگڵ. دیواری بە قوڕێکی، کە بە کا گیرابێتەوە سوواخ دەکەن و لە سەرویشە وە بە گێچی بەسەری دادێن.

**سیمەنسا:** سیمەنسا.

**سیمورغ:** سیمرخ.

**سیمی درکاوی:** سیمی خاردار.

**سین:** سنگ. ناوە بۆ تیپێک لە تیپە بیستەمینەکانی ئابێی کوردی.

**سینامەکی:** گیایەکی گەرمیانییە بۆ زگچوون باشە .

**سینان:** گوندێکە لە ڕۆژاوای چۆمی بشیرێیە گوندێکی ئاوەدان و تێرن.

**سینە** (موک.، کەل.، هەورا.): سنگ، سینگی گیاندار، (فە.) سینەک. سینگ.

**سینەئێشە:** سینگ ئێشە.

**سینەباز** (ئەردە.): سینگە و بازد، لەڕووی سینگەوە هەستان لەگەمەی کەوشەکێنیدا.

**سینەبەرە:** بەرەی وولاخ، سینەبەرە.

**سینەبەن:** سینەبەند، گەردنبەند.

**سینەبەند:** جورە خشڵێکی ژنانە بریتییە لەبەرمووریکی سێ لوولەی زێڕ یا زێوی پرپەرەداری پێوەیە. سنک بەندی وولاخی بەرزەیە و ئیتر، سینگبەند، سینەبەرە، بەرواکلە.

**سینەپالوو:** دەردی تەنگەنەفەسی.

**سینەپۆش** (جا.): سیخمە، بەروانکە.

**سینەچاک:** بێشەرم، شەرفرۆشی.

**سینەسپەری:** سینگ کردنەسپەر.

**سینەک** (فە.): سینگ، جوورێکە لە کاغەزی قومار.

سینەک

**سینەکردن:** کەوانەکردن.

**سینەکەش:** سەربەرەوژوور. ـــ ی: سەربەرەوژووری.

**سینەکەمان:** پارچەیەکە لە مۆزیقە چەند تاڵێک (ژێ) ی لێ قایم کراوە بە کەوانەییێکی ژێدار لێدەدرێ، دەنگێکی خۆشی لێ پەیدادەبێ.

**سینەم** (باک.): ناوی کچێکی سەرپێهاتییە.

**سینەما:** مەکینەیەکە وێنەی شت بە گەورەیی بە هۆی کارەباوە نیشان دەدا.

**سینەمەکی** (هەورا.): سینامەکی، گیایەکی گەرمیانی گەڵاووردی درێژکۆڵەیە بۆ ڕەوانی دەخورێ.

**سینەوبەرە:** سینەبەند، قایشێکی پێشووداره و بەزینەوە بە بەرسینەی چارەوێ دادێت بۆ قایم کردنی زین.

**سینەوول** (باک.): سینۆر.

**سینج** (باک.): محەجەری، کەنار پلیکان و دیوار یا دەرک و پەنجەرانە لەدار یا لە ئاسن

**سینچکە** (هەو.): باپشکێو، زیپکەی گچکە.

**سینچکەسلاوە:** سیچکەسلاوە.

**سینچی** (باک.): خوو، نەریت، ڕەفتار.

**سینکەبەند** (باک.): سینەبەند، سیلەبەند.

**سینکەر:** لاجڵەو، وولاخێکە نەرواولادا.

**سینگ:** ـــ ی دار: کەلەمۆک، سینگوولە، پێگورەک. ـــ ی ئاسن: گوڵمیخ. ـــ داکوتان: (باک.) ـــ خیم کرن. تەختەی پێشەوەی لەش، کە کەوتۆتە نێوانی گەرو و زگەوە، دەیی سینگی، (باک.) چیغ، (فە.) مێچ، سینە، (باک.) پزی، پێسیر. سنگ. سینگ کوتان: تووک لە کەسێکی کردن یان لە کاتی مردنی کەسێکیدا لەبەرپەرۆشان لەسینگی خۆدان. سوورژن.

**سینگەوبازد:** سنگەوبازد.

**سینگ پۆش:** سیخمە.

**سینگ زرە** (باک.): زرێ، پۆشاکی زرێ بۆ شەڕێ.

**سینگۆ:** قەمە یا نیزەییێکی تیژە، کەبەسەر تفەنگانیەوەدەکەن لەشەڕێدا لەسینگی یەکتری ڕادەکەن.

**سینگی پێ:** بەری پێ لەقامکانەوە تابن پانیە.

**سینۆ:** ناوی مرۆڤێکی ناودارە.

**سینۆر:** سنوور، کەوشەن. *

**سینۆرداش:** سنوور داش، کەسێکە بە قاچاغ بچێتە ناو وولاتێکی بێگانە، کە ئاشکرا بوو وەدەری دەنێن بەم کارە دەڵێن ـــ. *

**سینی:** (بۆتا.) بەرگەشن، مجۆعەمە، دەفرێکی پانی لێوداره نان و چێشتی لەسەردادەنرێ لەکاتی نانخواردنیدا. ـــ یی دار: تەبەق، خووان.

**سینیک** (باد.): قاپ، ئامان، دەفر، هی چێشتی، دەوری.

**سیوانخ:** سوواغ.

**سیوەد:** ڕووناکییەکە لەنێوانی شەوو ڕۆژیدا دەردەکەوێ. خوێنەوەواری، شارەزای خوێندن، سەواد. ڕوو. ــــ بوونەوە: چەقەسووبوون، ڕووداماڵران، شەرم شکان.

**سیوەدبوونەوە:** چاوکردنەوە لە خوێندندا یا لەکاروباریدا، ترس شکان.

**سیوەدکردنەوە:** شەرم شکاندن، چەقەسووکردن.

**سیواغ** (باک.): گورج. ــ کرن: هەڵدانەوەی قۆڵ و داوێن و ئیتر. (باک.) سوواغ.

**سیواق:** سواخ.*

**سیواک** (ع.): کورتە دارێکی باریکە سەرەکەی دەکوتن و موسڵمان لە دەمیانی وەردەدەن.*

**سیوان:** سەیوان، خێوەت، چەتر. (باک.) کەنارنوشتانەوە.

**سیووک:** (باک.) داسندی.

**سیوەڕۆ:** لەڕی و لاوازییەکە لە برسان یا لەبەر نەخۆشییێکی تووشی ئاژاڵ یا مرۆڤان دەبێ، کە ئیتر ئومێدی قەڵەوبوونەوەیان نامێنێ. (خۆ.) سیخەڕۆ.

**سیووڵ** (فە.): سمێڵ.

**سیوجگەر:** جەرگ و سی گیاندار.

**سیوسیوە** (هەورا.): تیف تیفەی دووای سەرتاشین. (کۆ.، دزە.) گرێژەنەی دەرکێ، بەرد یا دارێکی قووڵە گرێژەنەی دەرکەی لەسەردادەنرێ. (خۆ.) چیوچیوە.

**سیوسیوەی ڕانی:** نێک و جومگەی ڕانی.

**سیوێر:** سەخت، تون، توند.

**سیە** (هەر.): سی (٣٠). (زاخ.) سێبەر، نیسێ.

**سیەک** (باد.): سرکە.

**سییار:** سیدار، سیلدار. کۆتک، شاگرد، قوتابی، سوختە.

**سییەک:** دووپشک.

# ش

**ش:** تیپێکی ئابێی کوردییە. بەدووای هەرووشەیێکەوە بنووسێ واتای: هەم، ژ، دیسا، دیسان، لەگەڵ، ئەمەش دەگەیەنێ. لەبازاڕیش نەبوو: ژبازاڕیش نەبوو. (کە.) چۆش، چۆنش، هۆنش. بۆ ڕاوەستاندنی گوێدرێژیش بەکاردەبرێ. بەدووای ووشانەوە دەنووسێ وەکوو ئێوەش کوردن، واتە ئێوەش وەکو ئێمە یا فیسارەکەس کوردن؟.

**شا:** پادشا، کەی، پاشا، خونکار، میر، میران. هەنگ و زەردەواڵەیێکی گەورەیە، کە شانە هەڵدەبەستن و گەرا دادەنێن سەرۆکی چینی خۆیانن. میرە لە شەترەنجێدا. (شەقە.) تەماشا، شاشا، چار، چاوچاو، تەماشاکە، بڕوانە. (باک.) شاد، شادمان، قایل. خۆزیا، خۆزگە، خۆشا بە باری فیسارەکەس، واتە خۆزگە بەحاڵی وی. (ئەردە.) شابە حاڵی.

**شاب** (باک.): دارەبی، بی.

**شابادیە** (ئەردە.): بادی گەورە، ئامانی گەورە.

**شابار:** باری گەورە.

**شاباز:** چاکترین باز، بازی تەواری گەورە. بازی میری و خونکارانە. ناوی پیاوانە. ــ ی: حاکمەکانی، خانخانی.

**شاباش:** بەخشیشێکە تەنها لەکاتی داوەتێدا دەدرێ بە چاوەش و شایەران. چەپڵە ڕێزان، ئافەرین، بژی، هەربژی.

**شاباشکردن:** دراو و نوقڵێکە، کە هەڵدرێ بەسەر یەکێکیدا لەبەر خۆشەویستی یا بەسەر بووکێدا لەکاتێکیدا، کە دەگاتە بەردەرگای زاوا.

**شاباڵ:** باڵی باڵندەی گەورە بەتایبەتی ئەو شوێنەی کە پەڕی گەورە و شاپەڕەکانی پێوەیە، گۆیا سێ پەڕی درێژە لەهەر باڵێکیدا. باڵ (گەز) ێکی گەورەی مرۆیە.

**شابانە** (ئەردە.): شاوانە. یەکێکە لە دەرمانەکانی گیایی بۆ ئەو چتانە بەکاردێت، کە مەرزنجۆش لە پزیشکیدا بەکاردەبرێت.

**شابایە** (سەق.): گادۆشە.

**شابەدەم:** شەمەترێنکە.

**شابەڕوو:** بەڕووی هەرە گەورە، کەستانە.

**شابەنەر:** شابەندەر.

**شابەندەر:** سەرۆکی بازرگانان. شابەنەر. نوێنەری دەوڵەتێکییە لە ناو دەوڵەتێکی تردا تا کاروباری دەوڵەتی خۆی و هاوولاتییەکانی هەڵسووڕێنی. ئافرەتی بێ شەرم.

**شابەندەرخانە:** شابەنەرخانە، سەرایەکە شابەندەر تێیدا دادەنیشێ.

**شابەست:** بلۆسکێکی ئاسنە لەسەرەوە تا خوارێ، بلۆسکی ئاش.

**شابەک** (باک.): قەفی پرچ وکاکۆڵییە، کە بکەوێتە سەر نێوچاوان. (زا.) چۆغەی ڕانکییە.

**شابڵغان** (باک.): گیایەکە.

**شابوو** (ئەردە.): چەکچەکیلە، کوندەبوو، کوندەبەبوو، (ئەردە.) بووەکەرە.

**شابوون:** شادبوون. ــ ی (باک.): شادی، کەیفخۆشی.

**شابی** (باک.): شادی، کەیفخۆشی.

**شاپ** (ئەردە.): زللە، شەپەلاخە، بە لەپی دەست لە ڕوو یا لە ڕوومەتی کەسێکی دان. (ڕەوا.) شەپ، شەق. (باک.) چۆغە.

**شاپان:** تاکەکەی (شاپ) ە.

**شاپانکاری:** زللەلێدەر.

**شاپە** (باد.، بار.): پارچە بەفرێکی گچکەیە لە ڕنووی گەورە بێتەوە و بکەوێتە خوارێ. ڕنووە بەفرێکی گەورەیە، کە لە کێوان دەکەوێتە خوارەوە دەنگ و هاشەی دێ.

**شاپەدرەم:** (هەورا.) شەمەترێنکە. (هەورا.) شابەدرەم. زەرگەتەیەکی نێوقەد باریکە هەنگوینی زۆرباشە.

**شاپەڕ:** پەڕە هەرە درێژەکانی سەر باڵ و کلکی باڵندانە. (ڕەوا.) چخ. شمشیرە.

**شاپەسەن:** شاپەسەند، گوڵێکی چەند ڕەنگییە و سوورە، چارەیی، وەنەوشەیی، سپی.

**شاپەسەند:** گوڵێکی هەمەڕەنگەی بێ بۆنە لە ڕەگەزی سووراوییە و بەلآن لەوی پەسندترە. نێوی ئافرەتانە.

**شاپەلۆت:** جوورە بەڕوویەکی پانە.

**شاپەرزا:** شپرزە.

**شاپەک** (باک.): چۆغە، چۆخە.

**شاپلیتە:** شەپلیتە، شپلیتە، شەپلتە، سووکە، چرای دەستی. (باک.) پەلۆختە، دارێکی درێژە سەرێکی پەڕۆی نەفتاوی تێدەئالێنن و هەلیدەکەن بەهۆی وی بەشەو دەگەڕێن.

**شاپووراخ** (لو.): پەپوولە.

**شاپێنۆز:** پینەی پۆشەمەنی. شاردنەوە. ــ کرن: شاردنەوە. خووە ــ کرن: خۆ شاردنەوە.

**شات** (ئەردە.): شاتە، هاش و هووش. بەخۆفشین. (هەورا.) خەلّفی داورودرەختانە، ئەو لکە شلک و نەرمانەیە، کە بە تازەیی دەری دەکات، تووڵی یەکساڵەیە. (باک.) شەلەل، شەپلە. شەختۆ بوویە.

**شاتار** (ئەردە.): جوورە تارێکی گەورەیە.

**شاتاڵ:** شالاو، هەلّمەت، پەلامار.

**شاتان:** جوورە چنارێکە هەر لەتیرەی ئەسپیندارییە لق و چلّ و پۆپەکانی ڕاست لەگەلّ دارەکەی هەلّدەچن و بلاّویان ناکات لە ئەسپیندار بەرزترە و لە هەموو جوورە چنارێکیش باشترە.

**شاتاندن:** قیژاندن.

**شاتوول** (بابا.): بەسەر قیژاندن و شالاو بردنەسەر کەسێکی.

**شاتە:** هەراو دەنگەدەنگی بێشەرمانە. بڕوانە: شات. جوورە نانێکی تەندوورێیە.

**شاتەرە:** گیایەکی ناسراوە کەمێکی لەنێو کاسەی ئاودا بکوڵێ و تەنها قوڵتێکی بدات دووایە (٢٤) کاتژمێر لە ناو ئاوەکەدا بێ تا باش تام بداتەوە ئەوانەی ووشکە بیرۆ یا تەڕبیرۆ و خارشتیان هەیە چەند ڕۆژێکی بەیانیان لە خورینی نیو بەرداغ لە ئاوەکەی بخۆنەوە دووای پالاوتنی. خۆ، کە بە ئاوەکەی مەلّحەم دروستکرێ لە شوێنی بیرۆ و خارشتی بدەن زۆر باشە، جا بۆ مەلّحەم دەکوترێ و دەکوشرێ و بە ئاوەکەی مەلّحەم دروست دەکرێ.

**شاتەشات** (کە.): قیرەقیر، هەراهەرا.

**شاتر:** خۆشرۆ، بالّەبان، تەتەر. چوست، چالاک، نامەبەر، پەیک. ڕێک کەوتوو، بە دڵەوەنووساو.

**شاتری:** خۆشرۆیی، بالّەبانی. تیرەیەکە لە هۆزی جاف.

**شاتکردن** (ڕەوا.): کوژتن، تخ کردن، لەسەری باز مەدە تەواوی کە، تخی کە.

**شاتل:** گیایەکە.

**شاتلووره:** تایەرە گلگل.

**شاتوو:** گاتوو، تووشامی، (باد.) تی شەمبی، تووی سوور و ڕەش و گەورەیە.

**شات و شووت** (موک.): هەراهەرا، هەرەشە، خۆهەڵکێشان، فروفیشاڵ، شاتەشاتکردن.

**شاتیمان:** شەهادەتی ئیمان.

**شاجووان:** لاوی شۆخ و شەنگ، شای جووانان.

**شاخ:** تووڵەی دار و گیا و بڕکانە. (باک.) شووێنێکە لە چیای جوودیدا زۆر خۆش و ئاوداره هاوینگەها میری بۆتانی بووه، جزیری دەڵێ: شاخە عەمری بخووە بەرژێ وەژ قەیسەرامەکە بەحس. قۆچ، قۆڵۆچ، کلۆچ، سترۆ، ستروو، بێ ــ: بێ قۆچ، کۆڵ. دەفرێکی دارینە، باروتی تێدەکرێ و دەکرێتە مل. چیایەکە هەمووی بەردبێ یا بەردی زۆر بێ، کەژ، کێو، کوو. چیا. ناوی گوند یا کۆنە شارێکی کوردانە لەسەری باژاری جزیر و بۆتانێدایە لەناو چیای جوودیێ، گوودێ بەهەشتی جیهانی جێی چیرۆکان.

**شاخانە:** بزنانە. (جا.) کووده (لو.، کەل.) شامشەمار. پارەیەکە لە خاوەند مالاّت و ئاژاڵ دەستێنرێ لە خاوەند یا بەرانبەر بە لەوەڕی شاخ، مەڕانە لەلایەن میری یا ئاغاوە.

**شاخاندن:** شریخەکردن، شیتاندن، چریکاندن، قیژەکردن، حیلاتدن، شریخاندن.

**شاخانن:** شاخاندن.

**شاخلو:** جێی چرنووک لە ئەندام. ــ ی: جێگایەکە شاخ و کێوی زۆر بێ وەکوو کوردستان.

**شاخە:** دەنگێکە وەک دەنگی ڕووخانی خانووی بەرز و هەرەس هێنانی گاشەی زۆر گەورەی سەرشاخ.

**شاخە:** لقی داورودرەخت و چلّی گیا، بێچوو، وەچ، بەچ، منداڵ. (ئەردە.) قرمە، قرپە.

**شاخە خەنفیاگ** (ئەردە.): کەوش. لکی دارێکییە لەژێر خوڵ بنرێ و لە دوو سەری بهێنرێتە دەرەوە.

**شاخەکردن** (بابا.): هەستانە سەر پاشووانی یەکسمانە.

**شاخەشاخ:** چریکەچریک، شیتەشیت، شریخەشریخ.

**شاخەت** (کۆ.): خەتێکی گەورە و زۆر خۆشە. جۆگەیەکیشە هێندە گەورەبێ، کە چەندین جۆگەلان ئاوبدات، بەند.

**شاخەوان:** چیاڤان. (هـ.، خۆ.) شاخەوورز. کەسێکە باش بە چیایاندا بچێتە خووارێ و سەرکەوێ. ــ ی: چیاڤانی.

**شاخەوشاخ:** ئەم لکەولک. لە ــ دەفرین.

**شاخەوورز:** (هـ.، خۆ.) شاخەوان.

**شاخەی باردار:** لکی بەردار، شاخەیی پەیوەند.

**شاخەی پەیوەن** (ئەردە.): لکی بەردار.

**شاخەی خەنفیاگ:** شاخە خەنفیاگ.

**شاخەی مێو** (ئەردە.): تەرز، تووڵەی مێوێ.

**شاخێزی** (دزە.): مەرمەرشا، هومایێن.

**شاخدار:** بەشاخ، قۆچدار، خاوەند شاخ. گەواد، تەرەس. جوورە بەرێکی دار مازووە لە پانکە دەکا بەلاّم ئەم درێژکۆلەیەکی قژقژە. گیاندارێکە شاخی بێ. ــ ی: گەوادی، تەرەسی.

**شاخس:** دەستبلاو، دڵفراوان، بەخشندە.

**شاخسپی:** جوورە ترێیەکی سپییە وەمام برایەی دەچێ بەڵام ئەمە سەری گلووەکانی باریکە.

**شاخستان:** شاخاوی.

**شاخسی:** دەسوازی، بەخشندەیی.

**شاخکردن** (کە.): هەستانە سەرپاشوانی وولاخی بەرزەیە.

**شاخکەر:** چالاغ، تێتەسەردەس.

**شاخ لێدان:** قۆخ لێدان، شۆق لێدان.

**شاخ نفیر:** بۆق، کەڵەشاخ، بۆری.

**شاخ و بەڵەک** (ئەردە.): قەمزوناز. ئینجە و فینجە، تەختە و خاڵ.

**شاخوڕ** (باک.): چیای تزم و پردار و بەرد و زوغورد. ڕەنگە شاخی وورد و گچکە بێ.

**شاخ و هەملەر** (باک.): دوو دێی خۆشن بە داوێنی کێوی جوودێدا.

**شاخی:** کێوی، گیان لەبەر یا ڕووەکێکە هەر لە چیایاندا بێ وەکوو پلنگ و وورچ و ڕێواس و ئیتر. شاخی بۆری لێدانێ.

**شاخینی** (باک.): جحێڵی، لاوی.

**شاد:** شا، مادەخوەر، خەرۆ، پشکووتوو، کەیفخۆش، دڵخۆش، ئاغووش، دڵشاد.

**شادانە** (ئەردە.): تۆوی گوش، تووگووش. (ئەردە.) دان بەنگ. شەدانە.

**شادەمار:** شارەگ، رەگی هەرە ئەستووری گیان لەبەر و درەختان.

**شادەمەرگ:** کەسێکە لە خۆشیان بمری. ــ ی: شادەمەرگ بوون. ــ بوون: لە خۆشیان مردن.

**شادەنوێژ:** قامکی دۆشار مژە.

**شادبوون:** پشکووتن، هەوار، کەیفخۆش بوون، بەمرازگەیشتن.

**شادکامی:** شادمانی. بە مرازگەیشتن، بەخ.

**شادکردن:** خەرۆ و کەیفخۆشکردن.

**شادمان:** نێوی ئافرەتانە. خەرۆ، کەیفخۆش. ــ ی: کەیفخۆشی، شادی، دڵخۆشی. ــ بوون: کەیفخۆش بوون. ــ کردن: کەیفخۆشکردن.

**شادمانی سەردەمی بووکێ:** سوور.

**شادوان** (ئاکۆ.): شفرە. گیرە.

**شادی:** کەیفخۆشی، شادمانی، شایی، شابی، گوشادی، گەشی، گەشە. ڕەزم. دەماغ، خۆش، بەزم، کەیف، ڕووگوشادی، ڕووخۆشی، (باک.) بسکە، بسکەبسک. جوورە هەڵپەڕینێکە.

**شادیانە:** بەزم، ئاهەنگ.

**شادیانەی زایین** (ئەردە.): کوڕانە، گوێزەبانە، شادمانی و بەزم و ڕەزمی منداڵ بوون.

**شار:** باژێر، بازاڕ، شارستان، (ئەردە.) پاڵە، ــ ی چکۆڵە: شارۆلکە، هێشەت. ناوچەیەکی تایبەتییە لە مەیدانی توێەڕاکردنێدا. قارگە. ڕێژ، سەرشار، لێوڕێژ، بەتەنها بەکارنابرێ. لە دەورەی چەغزی گوێزێنیدا یەک دوو چاڵی گچکە دەکەن، کە ناوچەی گەمەیەکەیە. قزگە، شووێنێکی تایبەتی نیشانەکراوە لە هێندێ یاریدا وەک خۆشاردنەوە، تەرە ــ مرداری کەلێی کۆدەبنەوە. (ڕەوا.) شاش، نەکوتراو.

**شارا** (هەورا.): تایە، گیشە. (باک.) ئێجگار سووتێنەر. سۆزندە. (جا.) گێشە، تا، تەبارە.

**شاراشۆ** (ئەردە.): بە گێچەڵ، شەڕهەڵایسێن.

**شاران** (باک.): تەسبیح. (باک.) گەردەنبەند، زنجیر، ڕەسەن. (زا.) گوێز و بادامێکە وەک ملوانکە ڕستن دەکرێ.

**شاراندن** (باک.): گەرمکردن تا سوور دەبێتەوە، سوورکردنەوە.

**شارانگەڕ:** کەسێکە زۆر شاران گەڕابێ.

**شارانگە:** وێڵ، سەرگەردان.

**شارانگەشت:** شارانگەڕ.

**شاراوە:** شارراوە، قەشارتی، پەنهان. بەخاک ئەسپێر راو.

**شارە** (هەو.): کایەکە بە دەورەی چاڵێی دادەکەن تا دەغڵەکە تێکەڵ بە خۆڵ نەبێ. نێوی ئافرەتانە.

**شارەبان:** شارۆکەیەکی کوردستانی باشوورە. *

**شارەدێ:** دێی گەورە، گەورەدێ.

**شارەزا:** مەحلان، خۆجی، ڕێزان، کاراشنا، بەڵەد، کارزان، ئاگادار، جێگەرخوێن دەڵێ: هەرکەسێکی زانگەی شاربێ لەهی دەرەوە زیرەکتر و شارەزا و ووریاترە، بەراستی باشی بۆچووە. ئازا. نا ــ: نابەڵەد، بێ هونەر.

**شارەزابوون:** بەڵەد و مەحلان بوون. ئاگاداربوون.

**شارەزاکردن:** بەڵەد و مەحلان کردن.

**شارەزایی:** بەڵەدی، مەحلانی، ڕێزانی، کارزانی، کاراشنایی، زانایی، کارسازی.

**شارە زەردەواڵە:** هێلانەی زەرگەتە، جێگایەکە زەردەواڵە هێلانەی تێداکردبێ.

**شارەزوور:** ناوچەیەکی گەورەیە لەلای باشووری سلێمانیدا.

**شارەگ:** دەمار، شادەمار.

**شارەمار:** (باد.) هەلەمار، هۆلەمار. جێگایەکە ماری زۆربێ.

**شارەمرۆچە** (ئەردە.): شارەمێروولە.

**شارەمێروو:** کونێکە مێروولان هێلانەیان تێدا دروستکردبێ.

**شارەمێروولە:** شارەمێروو.

**شارەوا:** پارەی قاقەز، (ئەسکیناس). ئاوەدانی و ڕێک و پوختی.

**شارەوان:** بەڕێوەبەری شارەوانی لە رووی پاکی. شاردار، پارێزەری شار. ــ ی: بەڕێوەبەرێتی شارەوانی، شارداری.

**شارەوەدەر:** شاربەدەر، دەربەدەر.

**شارەوەدەربوون:** شاربەدەربوون، دەربەدەربوون.

**شارەوەدەرکردن:** شاربەدەرکردن، دەربەدەرکردن.

**شارەهەن** (ئەردە.): بەلوعە.

**شارباژێڕ:** شارێکە لە کوردستانی باشووردا. *

**شاربەدەر:** کەسێکە لەبەر خراپی و بەدکرداری لە ئاوەدانی دەرکرابێ.

**شاربەدەربوون:** دەرکران لە ئاوایی.

**شاربەدەرکردن:** دەرکردنی کەسێک لە ئاوایی لەبەر گەندی و بەدکرداری.

**شاردار:** سەرۆکی سەرایە.

**شارداری:** سەرۆکایەتی سەرای شار.*

**شاردرانەوە:** لەبەر چاوەوە لادانی چتێک، بزرکرانی شتێک.*

**شاردراوەوە:** شاراوە.

**شاردن:** شاردنەوە.

**شاردنەوە:** وەشاردن، ڤەشارتن، حەشاردان و وونکردنی چتێک، شارینەوە، پەنام کردن. خۆ ـــ: خۆ پینۆزکرن، قەلزین. شاردن، حەشاردان و وونکردنی چتێک.

**شاردنگە:** حەشارگە، قۆختە، حاشارگە، وەشارگە. سیپە، سەنگەر، جێگایەکە خۆ یا چتی لیٚ بشاررێتەوە.

**شاردنگە:** شووێنێکە چتی لیٚ بشاررێتەوە.

**شاررانەوە:** شاردرانەوە.

**شارراوە:** شارودراوەوە، حەشاردراو. ـــ یی: شاردراوەیی.

**شارسان** (ئەردە.): شارستان، شار.

**شارسانی:** شارستانی.

**شارسانیەی** (هەورا.): شارستانێتی.

**شارستان:** شارسان. شارێکی زلە، کە سەراو سەرداری لیٚ دانیشیٚ.

**شارستانی:** شارسانی، کەسێکە دانیشتووی شاریٚ.

**شارستانێتی:** شارسانێتی، ژیری، جەزایی، چاوکراوەوەیی.

**شارکەوانی** (رەوا.): خۆشاردنەوە، گەمەیەکە چەند منداڵێک چاویان دەقووچێنن تا یەکێکیان خۆی دەشارێتەوە.

**شارگە:** جێگای خۆ لیٚ شاردنەوەیە لە گەمەدا. کوزچک، کەمین بۆ ئەوەی ئەوەکوو لەپڕ ابێن بەسەریاندادەن.

**شارگر:** ووتەیەکە لە گەمەی خۆشاردنەوە لە کاتێکیدا بێتەوە سەر شار دەگوترێ.

**شارۆ:** مەبەس لە کۆڵێک دانەوێڵە چنینەوە لەناو جاڕدا یا میوە لەناو باغێکیدا دوای چۆڵکردنی باخەکە لە لایەن باخەوانەوە.

**شارۆخ** (هەو.): چەمیلەی ترۆزی، (موک.) کالیار، لە گەرمێنیٚ جوورە ترێزوێکی بەراوە بەقەد باسکێکی و گەورەتریش دەبیٚ بێتام و رەقە، (شار.) ئارێژە.

**شارۆلکە:** شارۆچکە، شاری گچکە.

**شارۆیران:** شارێکە لە کوردستانی باکووردا.*

**شاریٚ:** ناوی ئافرەتانە.

**شاریٚ:** شارێگا، رێگای زۆر فراوان و درێژ، کە رێگا و کۆڵانی زۆر بەسەرەوە بیٚ.

**شارێگا:** شاریٚ.

**شارێگە:** شاریٚ، شەقام.

**شاری:** شارستانی.

**شاریاگەوە:** شار راوە، پەنهان، پۆشیاگ، پەنام کریاگ.

**شاریان** (ئەردە.): وون بوون، پۆشران، پەنهان بوون.

**شاریانەوە:** شاریان.

**شارێشە:** شادەماری داروردەختان. شادەمار، شارەک.

**شارێخۆڵە:** (؟).

**شارینەوە:** شاردانەوە.

**شازادە:** منداڵی شا، میرزا، کوڕی میری، نەوەی شا، پاشازادە.

**شازدە:** شانزە، شانزدە، (١٦). ـــ مین: شانزەمین. ـــ هەم: شانزەهەم. ـــ هەمین: شانزەهەمین.

**شازدە هەنسە:** جەربەزە، بیٚ شەرم. خۆگر، بەرگر، نەبەز، خۆڕاگر.

**شازی، شامبازی** (باک.): جوورە مەیمونێکە زۆر لە مرۆڤان نزیکە.

**شاژن:** ژنی شای، خانمی میری، یای میری، (هەورا.) شاژەنی. باڵابەرز و جووان و شۆخ و ناسک و دڵگرترین ژن، کابانی لیٚهاتوو و بە مشوور.

**شاسە:** شەستە دانی زەوی کێڵرا و تەخت و رێک کردنی، ماڵوو.

**شاسەلیم بازی:** پاڵەوانە کەچەڵ.

**شاسەیوان:** چەتر و سەیوانی پادشایان، خێوەتی شا، خێوەتی گەورە. خێوەتی پادشا، رەشماڵی زۆر گەورە، سەیوان و چەتری پادشا. خێڵیلە.

**شاسووار:** کەڵەسوار، سوواری هەرەباش، مرۆی تەردەست و ئازا و کارین.

**شاش** (باک.): شاشک. پێچ، مێزەر، مەندیل. بلاو و فش، واژی سفت. تەنک. واق ووڕمان. ئازاد چیایی ـــ کرد: سەرگەردان کرد، لە رێی دەرخست.

**شاشان:** نێوی ئافرەتانە. جوورە گەوهەربەندێکە، کە پادشایان لە قۆلیانی دەکەن، وەکوو لەو تاکەدا: دوڕ و یاقووت و مەرجان سەرئەفراز هەتا شاشان.

**شاشە:** شاسە.

**شاشەم:** شەم و مێوی زۆر گەورە.

**شاشبەن** (ئەردە.): مێزگیران، گمێز گیریان.

**شاش بوون:** واق مان، (هەورا.) سوورمەنە.

**شاشخاپێن:** زمانلووس (ڕیاکار)، کەسێکە لەژێر پەردەی ئایینیدا دەستی ئەم و ئەو ببڕیٚ.

**شاشخاپین** (باک.): زمانلووس(ڕیاکار). ـــ ی: زمانلووسی، ڕیاکاری.

**شاشک** (باک.): مێزەر، سەرپێچی پیاو، شاش. شووشە.

**شاش کردن:** واق ووڕکردن.

**شاش و وێش:** چتی زۆر شاش.

**شاشیک** (باک.): مێزەر، مەندیل، شاشک.

**شاعر** (ع.): هۆنەر، هەستیار، بوێژ، هەڵبەس.

**شاف:** بەقەد سنجوویەکی لە سابوون یا چتی تر لەناو کۆمی مرۆڤی گرفتاردا دەنرا تا رەوانبیٚ، لە هەندێک چتی دی دروستەکریٚ و هەڵدەگیریٚ بۆ مایەسیری.

**شاف پێهەڵگرتن:** شاف لێدان، مەبەس لە فریودانە بەزمانی لووس.

**شاف لێدان:** شافپێهەڵگرتن. تەفرەدان.

**شفر** (باک.): خانووچکەی ئابووت. پێست و کەولاوی، کەوڵدار. (باد.) پنجە گیایەکە پەڕە ئامێزێکی چڵ چڵ بڵند دەبیٚ منداڵان لاسکەکانی دەکەنە تیر.

**شەفەهەڵگرتن:** خۆ دەرمانکردن بە شاف. *

**شاقا** (باد.): هەنگاو.

**شاقەشین** (باد.): شینەشاهۆ.

**شاقین** (باد.): دەنگی کەروێشک.

**شاق:** شاق باق و شاق واق، شاقشاق لە دەنگی مریشکاندا دەردەکەوێ.

**شاقاو:** شەقاو، هەنگاو.

**شاقەشین:** شاهێن (باڵندەیەکە).

**شاقەل:** چمک، داوێن، دامنە، چاک، شاقڵ.

**شاقەڵ:** قەبارەی گیاندار. باڵی باڵندەی گەورە.

**شاقەلدار:** کەسێکە بەرگی وای لەبەردابێ شاقەل و داوێنی هەبێ.

**شاقروان:** بوق.

**شاقشاق** (باک.): قرتەقرتی مریشکانە.

**شاقڵ:** شاقەڵی کەوا، چاکلی کەوا. داوێن، دان.

**شاقواق** (باک.): شاقشاق. قرتەقرتی مریشکانە.

**شاقۆڵ** (ئەردە.): شاوول.

**شاقولاپ:** قولاپی گەورەی جقەدار.

**شاقوڵی ئاغا:** داعبایەکی ڕەشی گچکەیە زۆرجار لە چای هەنجیردا دەبینرێ.

**شاقوت:** چیچە، چل، گۆی مەمک.

**شاقووت** (زا.): پەلی دارە گوێزێکە، کە براب‌ێ.

**شاقوول:** فاقە، تەپکە. شاوول.

**شاقێن:** دەنگی کەروێشکی.

**شاک** (باک.): زیرەک، کارزان.

**شاکار:** شاکردار، کردەوەی زۆرباش و گرنگ و بەرز و پوخت و بێ وێنە.

**شاکاشی:** (هەو.) مەڵکانە. قاندەلووک، قاپێکی زۆر زلی گڵێنییە ماست یا دۆشاو و چتی تری تێدەکەن.

**شاکەشاک** (هەو.): پاڕانەوە.

**شاکردار:** شاکار، کرداری میرانە.

شاکوڵ

**شاکوڵ** (زا.): پێڵاو.

**شاکۆڵ** (باک.): گۆچان، داردەست.

**شاگا:** شەگە، لەجیاتی سەلام.

**شاگە:** شەگە، شەگگە. (ڕەوا.، هەو.) بالابڵند، بەژن درێژ، بالا بەرز.

**شاگەردانی** (ئەردە.): پاشاگەردانی.

**شاگەشکە:** نێگجار شاد و کەیفخۆش، شادگەشکە، فێیەکە لە خۆشیان مرۆی بگرێ، لە خۆشیان ـــ ی هاتێ. چەمۆڵە.

**شاگرد:** قوتابی قوتابخانە، (ئەردە.) سیاری. بەردەستی پیشەگەران، بەروەستا. ـــ ی: پیشەی قوتابیەتی. کردەوەی شاگرد لەبەردەستی وەستایان.

**شاگردانە:** چێشتانە و بەخششێکە بە شاگردان بدرێت. وەکوو شاگردان.

**شاگردە:** دارێکی درێژی قەلانگەدارە جۆلا ڕایەلی پێ بژار دەکات.

**شاگرداروغە:** گزیر. تەنگەچەری.

**شاگوڵ:** گوڵی هەرە گەورەی گەنم و جۆیە، بۆ هەموو گوڵێکیش بەکاردەبرێ، کە باش و زۆر جوان و دڵگرترین یا گەورەترین بێ.

**شاگونج:** گونجێکی گەورەی دارینە لەناو دەمی نێ دەنرێ و تەندوورەی ناشی گونجێکی بچووکتری تێ دەبڕێ.

**شاڵ:** شەوشەپک، ڕانک و چۆغە. پارچەیەکە لەپاش ئەوەی، کە وولاغ ڕنەک کرا پشتی چارەوێی پێ دەسترنەوە. پشتێندی کەسکی سەیدان یا مێزەری سەوز. ـــ ی تورمە جوورە کرێکە جۆلایان لە خوری و چتی تری دروستی دەکەن و زۆر جۆری هەیە. (کە.، جا.) بووزوو، جوور و ڕەنگ و هۆی ناوبردنیان ئەمانەن: بەکریەگی، بازانی. بنەفشی، بیرکەهی. چارمەکووک، دگور. نێزدین سەری، گولاشاچی. مادانی، نوسمان بەگی. مرشکی، قاجیتی. ڕێنۆبەری، ڕەنگی بەروی. سایا، سپی سادە. سەماوی، سەیفکی. سیمەکووک، ستۆکەو. تەختی بەنەفشی.

**شالانگ** (کە.): جوورە گیایەکە.

**شالاو:** شاتاووڵ، پەلامار، هەڵمەت. هێرش، نێرش (بۆ سەگ و درندە).

**شالگەردن:** مل پێچ، گەردن پێچ. (باک.) ئلێمی.

**شالشتە** (هەورا.): بوخچە.

**شالۆر:** باڵندەیەکە ڕەنگە شەلاقە بێ، هەندێک کەسیش بە بولبولی دەزانن.

**شالۆک:** (هەورا.) قەلانک، قالنگە.

**شالۆل** (باک.): شالوور.

**شالوور:** جوورە بولبولێکە. (باک.) شالووک، شالوول، شالۆل، شەهلوول.

**شال و شەپک:** ڕانک و چۆغە.

**شالووک** (باک.): شالوور. (ئامێد.) داس.

**شالوول** (باک.، لەه.، خۆ.): شالوور.

**شالی** (باک.): نانی شەکری، کولێرەی چەوەندەری.

**شالیار:** وەزیر. بەڵێ شایی (پادشایی) بێ ـــ نابێ.

**شالیارگە:** وەزارەت.

**شالیاریانە:** وەزیریانە.

**شالیگا:** مەرمزەجاڕ، جارمەرمزە، چەڵتووک جار.

**شاڵینە:** دەفرێکی چوارگۆشە لەشال دروست دەکرێ بۆ زۆر مەبەستان بەکاردەبرێت لەناو ماڵێدا. (هەورا.) چارۆگەی خوری گەورە. گڵێمە، چەپاڵێکی چوارگۆشەی خورییە. کۆلوانە لە بووزو دروستدەکرێ.

**شام** (فە.): چێشتی ئێواری، نانی ئێواری، بێ ـــ: بێ نانی ئێوارە. شێڤ، شیو. (فە.، ئەردە.) ئێوارێ. شاری (دمشق) کوردی زۆر تێدایە: (حي الاكراد، مهاجرين)، لە نزیک چیای (جلق). لە وولاتی شامێشدا کورد زۆرە. شەو. خۆراک و خواردەمەنی شەوێ.

**شامات:** دەشتێکی شۆرەکات، مەڵبەندێکە لە کوردستان، ووشەی دۆڕانی شەترەنجە. *

**شامار:** هەژدیها، ئەژدیها، ئەژدەها، ماری گەورە.

**شامبازی** (باک.): شازی.

**شامبۆز:** ئازا، دروستکار، سەرڕاست. زانا.

**شامخوواردن:** شێو خوواردنی ئێواری.

**شامکردن:** شامخوواردن.

**شامۆیی** (زا.): جووره تورتنێکی بێ کەلکە.

**شامێر:** شەهمێر، پردڵ، ئازا.

**شامێروو:** کەڵەمێروو، کەڵەمۆری، گەورەی مێروولان.

**شامی** (فە.، لو.، دەر.): شووتی، شفتی، هەنی. (باد.) سەرتاووسی. (باک.) جووره مریشکێکە.

**شامی تاڵە** (فە.): گووژاڵک، کاڵەکەمارانە.

**شامیران:** میری میران، شاهەنشا، سوڵتان.

**شامیلە** (شا.): گاتوو، تووشامی، (هەورا.) سووره تفی.

**شان:** باسک، باڵ، تیرەشان. تەنیشت تۆقەسەری گرد و چیایانە، پایە، جێگا، پەرسە. پلە، ڕێزە، گەورەیی شکۆ، بارە، حەنا، ئەنازە. (هەورا.) شانە. (زاخ.، دهۆ.، باد.) پۆل. (باک.) پیل، پی، مل. ئێسقانی ڕاست و چەپی ژێر مل، کە هەردوو قۆڵی پێوەیە. شایان، شیان. ئافەند. پیشان، ڕەوابوون. توانین، لە توانادابوون. شانە، چتێکی کونکون و گردە هەنگ و زەردەواڵە هەڵیدەبەستن تا هەنگوینی تێکەن، هێلانە هەنگ، ماڵەهەنگ. بزنێکە سەری زەرد بێ. پەنک، خاڵ. خاو. ـــ شکان: خاوشکان.

**شان شکاندن:** خاوشکاندن.

**شانا** (لو.): شانە.

**شاناز:** نێوی ئافرەتانە. نازوفیزی پادشای، کەشخەی میری. ـــ ی: هەڵشەنگان، نازین، شۆگایی، قوونەت، مایەی سەربڵندی، کۆڵە، پێداخورین، بەخۆفشین، خۆهەڵکێشان. ـــ کردن: هاش و هووش و کۆکردن، پێخورین، نازپێوەکردن.

**شانامە:** داستانێکی هەڵبەستراوە لەلایەن فیردەوسی توسی یەوە. نامەی شایانە، باشترین نامە. نامەیەکی زۆر دوور و درێژە.

**شانان** (هەورا.) لێدران.

**شانانن** (هەورا.): لێدان.

**شانای:** وەشاندن، چاندن، ناشتن. (هەورا.) تەکاندنی دار و هەڵوەرینی بەری.

**شانە:** دارۆغە. سەرۆکی شاگرددارۆغان. (باک.) گەرەک. شانێ هنگڤێ: شانەی هەنگوینی. ئاسنێکە فیشەکی تێدەخرێت بۆ دەمانچە و تفەنگ. (ئەردە.) ئەردە، لێسە. ماڵە. شە، شەه، شەهک، سەرشەهک، سەرشەه، موو و تووکی پێدادەهێنرێ. ـــ کردن: گووزنیک. (هەورا.) شان. شانە و دەفری جۆلایی. ئەو کەسەیە لەلایەن ئاغاوە خەرمانان هەڵدەگرێ، سەرکار. شە، چتێکە تووکی سەری پێدابهێنرێ. (ئەردە.) دیانە، شانە ئاوریشم داهێنان.

**شانەشین:** شانشین.

**شانەکار:** ئافرەتێکە سەری ژنان ڕێک بخات.

**شانەکردن:** ـــ ی موو: داهێنانی بەشانە.

**شانەگەر:** کەسێکە شانەی دروستبکات.

**شانەوشان:** بە کەشخە و فشی ڕۆیشتن و شان بادان.

**شانەی جۆلایی:** دەفەی جۆلایی، شەمتە.

**شانەی خوری:** جووره شانەیەکی تایبەتییە خوری پێ لە شانە دەدرێ.

**شانەی هەنگوینی:** شانێ هنگڤێ.

**شانەیی:** سەرکاری.

**شان بەشان:** بێ پاشە و پێش کەوتن، بەرانبەربوونی دوو کەسانە بە چەشنێک، کە لە ڕێز و تەنیشتی یەکتریی یەوەبن.

**شان بەشانی کێوی:** بەملدا وەسەرکەوتن.

**شان بەلای شانداان:** شان لێدان، شان لەشاندان.

**شان بڵند:** پایە و پلە بڵند، گەورە و مەزن، بلندجەهە، جێگەبەرز، شاندار. ـــ ی: گەورەیی، مەزنی، پایەبەرزی، جێگەبەرزی.

**شانۆش:** دەسماڵی ژنان، چتێکە بدرێ بەسەرشاندا.

**شان داچەکان:** شل و شۆڕی ئێخەی پۆشەمەنی.

**شانداچەکاو:** کەسێکە ئێخە و گەردەنەی کراس و کەوا و ئیتری شل و شۆڕ بێ.

**شاندادان:** بریتییە لە نوستنێکی کەم، مەبەسیش لە مردنی یەکێکیشە. لەڕووی سووکییەوە بەکاردەبرێ.

**شاندار:** شایان، شیاو، پایەبەرز، پایەبەند، بەشکۆ. ـــ ی: شایانی، شیاوی.

**شاندانەبەر:** هەوڵدان، تێوەچوون.

**شانداهێلشتن:** شاندادان، پاڵکەفتن، درێژبوون، ڕاکشان.

**شاندەلیک** (باک.): زەردەلیک.

**شاندن** (باک.): ناردن، هنارتن. بشینە. (کەل.) چاندن، ناژتنی تۆو و چتی تر.

**شاندی** (باک.): شۆفار.

**شاندیار** (باک.): سەرۆکی والییان.

**شانزە** (هەورا.): شازدە، کە بریتییە لە (٣) جار پێنج و تاکێک، (١٦).

**شانزەمین:** شازدەمین.

**شانزەهەم:** شازدەمین.

**شانزەهەمین:** شازدەمین.

**شانزدە:** شازدە.

**شانزدەهەمین:** شازدەمین.

**شانس** (فە.): بەخت.

**شان شکاندن** (هەو.): خاوشکاندن.

**شانشین:** کۆشکی شاهانە، گەنجینە، باڵەخانە، خەڵوەتی، شانەشین. ـــ ی خانووانە، گەنجینە. پایەتەخت.

**شانک** (باک.): عازەبی، زیبکەی عازەبی.

**شان لەشاندان:** خۆگەیاندنە پایەی یەکێکی تر، کەوتنە ململانێ و خۆڕەسەرخستن، دەست و پەنجەی یەکتری نەرمکردن.

**شانگ** (فە.): شانە.

**شانن:** شاندن، وەشاندن، پژانن، ئاوپرژێن کردن. هەڵوەشاندن، هەڵتەکاندن. تەکاندن.

**شانۆ** (هەورا.): شایان، شیاو. شوێنێکی بەرزە لە تەختە دروست دەکرێ هونەرمەندان لەسەری گەمەی دەکەن و هەڵدەپەڕن. تەمسیلیشی لەسەردەکرێ.

**شان و شەپیلک:** بۆ تیز پێکردن بە یەکێک بەکار دەبرێ، کە ئێخە خوار و داچەماو و شان و شەپیلکی نارێک و ناپوخت بێ.

**شان و شکۆ:** بەرزی پایە و شان.

**شانوو:** شانۆ.

**شانوشین:** گوندێکە لەرا سەری شاری نسیبینێیە، شاهنوشین، جێگای ڕۆنیشتنی پادشا و میر و خونکارانە، خانی لە مەم و زینێدا دەڵێ:

شازادەیە شانشینی مەکانە
عنقایە بلـــندە ئاشیـــانە

شانوشینی کردۆتە قصری میری بۆتانی. دوو سەکۆی چکۆڵەیە لەملارلای پلیکانان دروست دەکرێ، کە پێدا سەردەکەونە سەرکۆشکێ. پایتەخت.

**شانی** (باک.): نیشان. ــ دان: نیشاندان. (جز، بۆتا.) خەمگین، پەرۆشدار. (لو.) شانە.

**شانی دان:** (باک.) نیشاندان.

**شانین** (ئەردە.): فڕێدانی چت، پەرتکردن.

**شاو** (باک.): ڕچە، باریکە ڕێگە.

**شاوباز:** شاباز، نێوی پیاوانیشە.

**شاواش** (ئەردە.): شاباش، زەڕوەشان.

**شاوانە** (ئەردە.): شابانە. جوورە گیایەکە.

**شاوە:** (کۆ، موک.) باڵندەیەکی شینە بەقەد لەگلەگێکییە بەڵان لاقی کورتترە و ملی درێژە و ناوییە و لە گوێی ئاواندایە و گۆشتیشی دەخورێ. (هەورا.) شاهۆ، شینەشاهۆ، شاهین، شاهێن.

**شاوڕۆڵ:** شاوڕۆڵ.

**شاوۆڵ:** کانێکی خڕی قورسە بەتێکی تێخراوە وەستایان خوارو خێچی دیوارو ئەستوندە و پایەی پێ بەراوەرد دەکەن.

**شاوولی**(هەورا.): شاگوڵ.

**شاوی:** دز.*

**شاوێر:** گیایەکی هارینی بە چڵچڵ و باریکە چەند جارێک دەدروێتەوە. (هەورا.) شەوەڕ. (دەر.) شافر. بۆ حەسیر و سەربانی کۆخان بەکاردەبرێ.

**شاوێری** (ئەرگوو.): ڕێواسی قوڵەبنەیە.

**شاه:** شا، پادشا، میر، خونکار. یەکێکە لە کەرستەی شەترەنجێ.

**شاها:** نێوی ئافرەتانە.

**شاهانە:** پادشایانە، میرانە، شایانە، وەکوو میر و پادشایان.

**شاهەنشا:** سەرۆکی چەند پادشایەکی. قەراڵ، شەهەمرشا. میری چەند نەتەوەیەکی، شای شاگەل. ــ یی: شایەنشایی.

**شاهەنگ:** پادشای هەنگان، هەنگێکی گەورەیە لەناو پوورەی هەنگاندا شانەی هەڵدەبەستی.

**شاهد** (ع.): گەوا، ئاگا.

**شاهکار:** شاکار.

**شاهنامە:** شانامە.

**شاهۆ:** شینەشاوە، شینەشاهۆ، شاوە، شاهێن، باڵندەیەکی گەورەی سپی واشە بەقەد لەگلەگی دەبێ بەڵام قاچ و دندووکی ڕەشە و گۆشتیشی دەخورێت. نێوی زنجیرە کێوێکییە لە هەورامانێدا کەوتۆتە لای ڕۆژهەڵاتی خوارووی هەڵەبجەوە.

**شاهی:** شایی، پادشایی، میری، خونکاری. (باک.) شادمانی، دڵخۆشی، کەیفخۆشی. جوورە پوڵێکی کەمنرخە.

**شاهێ کەوا** (باک.): کەوێکە چاو و پەنجە و دندووکی زەردبێ.

**شاهێن:** شاباز، شاقەشێن، شەنهاوز، شاهۆ، شەهێن، شاوە، باڵندەیەکی بۆری گۆشت خۆرە و لە باز گەورەترە.

**شاهیک:** (باک.) جێگایەکە خلیسکی لەسەری بە ئاسانی بکرێت. لووس. ــ کردن: لووسکردن.

**شاهین:** شاهێن، شاوە.

**شاهینەت** (باک.): کەیفخۆش.

**شاهینی:** پادشایەتی، ئازادی، سەربەستێتی.

**شایار** (ئەردە.): شالیار، وزیر، هاودەمی شا.

**شایان:** گۆڕ، ڕەوا، بەڕێز. ستیلهە. وەشاوەوە، شیان، شان، شیاو، لێی دەوەشێتەوە: شایانە.

**شایانە:** میرانە، خونکارانە.

**شایانێتی:** بەڕێزی.

**شایانی:** بوونی چتێک بەوەی چتێکی تری لێ بوەشێتەوە.

**شایەتیدان:** شەهادەتدان.

**شایەد:** شایەت. بەشکوو، بەڵکوو، گاهەس.

**شایەر:** دیلانەبێژ. شایار، هەستیار، هۆنەر. ووشەی شاعر لە شایەر وەرگیراوە. گۆرانی بێژی شایی. ــ ی: دیلانەبێژی.

**شایەن** (جا.): تەرازوو. میلە درێژەکەی سەرماوەی تەرازوو، کە درولنگە تەرازوو بەم سەروسەرەوەیە.

**شایەنشا:** شاهەنشا.

**شایەنشایەتی:** شاهەنشایەتی.

**شایجان** (ئەردە.): لە شاهجان وەرگیراوە.

**شایچرا:** شاچرا، پیرە.

**شایف** (باک.): کلا. ــ بوون: لادان، کلابوون.

**شایک** (باک.): لووس. ــ کردن: لووسکردن.

**شایلۆغان** (هەورا.): تووتەک و باڵەبان، مۆزیقە. مارشی شاهانە، میرزا مستەفا دلی دلی دەڵێ:

شایلۆغان ژەنیا وەقـاپی شـاوە
سامی سەرهەنگان مەدراوە پاوە

**شاینەک** (دەر.): باشوو.

**شایێن:** شەهین، شاهین. میلی تەرازوو. جوورە چەرخێکە.

**شایی:** پادشایی. پوولێکی مسینی کەم نرخ بووە قرانێک جاران (٢٠) شایی بووە. هەڵپەڕین، چووزەکێ. جوورە هەڵپەڕینێکە. ئاهەنگ و زەمزەمە. (هەورا.) زەماوەند. شاهی. (دەر.) سوویر. سوور. دیلان.

**شاییە:** شاییستە، ڕەوا، ڕجوا.

**شاییستە:** شاییسە، شایان.

**شاییستەکار:** چتێ یا چەند چتێکە، کە ببێتە هۆی شایان ولێ وەشانەوە بۆ چتێکی تر. ــ ی: بوونە شایان و لێوەشانەوەی چتێ یا کەسێ لە چەند چت یا چەند کەسێکی تر.

**شاییستەی:** شایانی.

**شاییشایی:** خۆشی خۆشی.

**شاییکار:** کەسێکە شایی بکات.

**شە** (هەو.): مرازێکە لە کەرەستەی خەرەکێیە. شانەی سەران. شەنەی کای. خوورێیە ــ ی هەڵێناوە، شێ، تەڕایی، نم، نیم. تربووس، دەلاّنە، ڕەوا.

**شەب:** زاخ.

**شەبازللە:** بە بەری دەستی بە توندی لە ڕوومەتی یەکێکی دان.

**شەباقە:** کونی گەورە، دەلاقە.

**شەباک:** شەبەق.

**شەبەش** (باک.): کاڵەک، گندۆرە.

**شەبەق:** تروسکە، ڕووناکی، ڕەمی، ڕووناکی قەراخی ئاسمان لە بەیانیدا. (ڕۆژ.) بریق و باقی ڕووناکی. کونی گەورەیە لە دیوار و پۆشتەمەنیدا.

**شەبەق تێبوون:** شەبەق تێکەوتن.

**شەبەق تێکەوتن:** کون بوونی کالاّ و دیوار بە جۆرێکی فراوانی و گەورەیی.

**شەبەقدار:** ڕووناک. ــ ی: ڕووناکی.

**شەبەقدان:** ڕووناک بوونەوەی قەراخی ئاسمانە لە بەیانیدا.

**شەبەق شەبەق بوون:** کونکون بوونی دیوار و کالاّ بەفراوانی و زلی.

**شەبەقی:** کاتی بەیانیان، کاتی شەبەق.

**شەبەک** (باک.): ئێخە. (باک.) تۆڕی ماسی گرتنییە. تیرەیێکی کوردە لە کەنار موسڵ و کەرکووکێن.

**شەبەکەی چاو:** تۆڕی چاو.

**شەبەندەبەڕۆژ** (بابا.): کۆڵکەزێڕینە. جوورە خامەکێکی زۆر جووانە بە گەلێ ڕەنگ دەنوێنێ.

**شەبەنگە** (کە.): شەوگار، شەوانە. (موک.) شەوێنی ئاژاڵانە لە شەودا.

**شەبەنگەڕۆژ** (بابا.): کۆڵکەزێڕینە.

**شەبیخوون:** هێرش و پەلاماردانی شەوێیە بۆ سەر دوژمنان، چەپخوون، شەونخوون، شەویەڵغار.

**شەبخان:** داوێن و گۆشەی کەوا.

**شەبسان:** شەبسسان. سەیزان، ژێرخان.

**شەبکان** (باک.): نێشان، ژانکردن (بشەبکە).

**شەبکاندن** (باک.): نێشاندن، ژان پێکردن لەبەر نەخۆشی یا ماندوێتی. بشەبکێنە.

**شەبکین** (باک.): نێشان، ژانکردن.

**شەبۆت** (باک.): جوورە ماسییەکە.

**شەبیک** (باک.): نەقیزەی وولاّخ لێخوڕینێیە.

**شەبیکین**(باک.): ڕەقێتە، ڕەقیتە.

**شەپ:** شەق، شاپ. (هەو.) پێن. (کە.، هەو.) شەقەزللە. ــ ێکی پێدادا: شەقەزللەیێکی لێدا. (باک.) ئاسایی. پڕ، ئەندازەیەک، مست. ــ ێک کشمیش: پڕچەنگێک مێووژ. گەلێک جار لەپێش ووشەی شۆڕ بەکاردەبرێ: شەپ و شۆڕ: شەپاڵە.

**شەپازللە:** شەقەزللە.

**شەپاڵ:** شۆخ و ــ: شۆخ و شەنگ و جووان، (باک.) شۆخ وشەنگ و جووان، نازەنین، نازدار، تەڕوتازە. (باک.) دەشت. (باک.، باد.) جوور، چەشن. (باک.) چتی جووان و باش، شەنگ و شۆخ.

**شەپاڵ:** وەکوو سەگی، بێ شەرم، ناوڕووتکاو.

**شەپاڵە:** بەلەپی دەست لە کەشی کەسێکی تر دان، شەپەلاّغە، زللە، چەپاڵە.

**شەپاڵەلێدان:** زللە لێدان.

**شەپاڵمە** (کە.): شەپەلاّخ، چەپۆک، شەپاڵە.

**شەپاڵۆخ** (خۆ.، باڵە.): وەروەرەی بەفرماڵینێ.

**شەپان** (خۆ.): شڵەقان.

**شەپاندن** (خۆ.): شڵەقاندن.

**شەپە** (باک.): کۆمای بەفرییە.

**شەپەڕ:** شاپەڕ، باڵی پەڕەوور و فروسکە و ئیتر.

**شەپەزللە:** شەقەزللە.

**شەپەشەپ** (دزە.): قسەیەکە هەر منگەمنگی لێوەبێ. شڵپەشەڵپ، خشەخش، دەنگی درووداوێنی شۆڕ، کە تەڕبووبی و لە زەوی بخشێ، شەپشەپان.

**شەپەلاّخە:** (هەورا.) پژملە. (کۆ.) تۆقات. (دەر.) تۆقە. (کە.) شەقەزللە، شەپاڵمە. ــ لێدان.

**شەپەڵۆخ:** گیانداری چاوبرسی، زۆرخۆر.

**شەپەلووح:** دارێکی گەرمێنییە بەرێکی دەگرێ وەک هەنجیر و دەخورێ و لکە گەورەکانی وەک شووتی توولە دەهاوێ.

**شەپەڕەوی:** چەپڕەوی.

**شەپەرزە** (باک.): شپرێو، شپرزە.

**شەپەرزەیی** (باک.): شپرزەیی، شپرێوی.

**شەپرێو** (موک.): شپرزە. مرۆی شەپ و شۆڕ.

**شەپریو:** مەردومی شەپ و شۆڕ.

**شەپرێوی** (موک.): شپرزەیی.

**شەپشەپان** (ئەردە.): شەپلی شۆڕین. بەدەستی بە سێو و تۆپی لاستیک یا چتێکی تر لە هەوادا گەمەکردن.

**شەپقە:** شەپکە، کڵاوێکی لێواردار و زلـە و نسـێی لەسەر دەم و چاو دەکات.

**شەپک:** چۆغە. شاڵ و شەپک. پێل، شەپیلک. تەختەی نێسکی هەرەگەورەی شانییە. تەختەی جۆلاّیی.

**شەپکە:** شەپقە. ـــ ی بە گەڕ: شەپکەی بەدەورە. ئەو دارەیە، کە دوو سێ دار یا تەختان پێکەوە بنووسێنێ وەکوو ـــ ی دەرکان، (هەورا.) پشتە. یەکێکە لە مرازەکانی کەرستەی جۆلاّیی. داو، تەپکە.

**شەپلاّخ:** شەپەلاّغ.

**شەپلاّخە:** شەپەلاّخە، شەپاڵە، چەپاڵە.

**شەپلە** (هەورا.، موک.): دەردێکە لە هەر پەل و ئەندامێکی مرۆڤ بدات بێ هەستی دەکات و لەکار دەکەوێ.

**شەپلەلێدراو:** لـە گۆ کـەوتوو، بۆ ئـەندامێک بـەکاردەبرێ، کـە بـێ هەست بووبێ و لەکار کەوتبێ.

**شەپلەقوونە:** جوورە گەمەیەکە.

**شەپلێتە:** شاپلێتە، پلێتەی ئاوراوی.

**شەپلی شەپان** (ئەردە.): شەپشەپان.

**شەپلی شۆپان:** شەپلی شۆپێن.

**شەپلی شۆپێن:** گەمە بە سێو یا بە چتێکە وەکوو تۆپی کردن لە حەوادا.

**شەپۆپان:** پەشۆکان، شێوان، تێکچوونی کاروبار.

**شەپۆپە** (کۆ.): شـەی جۆلاّیانـە، مـەکووک، مرازێکـە لـە کەرسـتەی جۆلاّیاندا.

**شەپۆتە:** دەفەی جۆلاّ.

**شەپۆڕ:** شیوەن، شین، شیوەنی تێکراییە بە کوڵ.

**شەپۆکان:** پەشۆکان.

**شەپۆکیان:** شەپۆکان، پەشۆکان، شپرزیان.

**شەپۆل:** پێـل، (باک.، باد.) پێلچۆک. (باک.) بـەیار، سێپەل. لیپە، لیپـاو. تـەکاندنی ئـاوە بـەهۆی چتێکـەوە. ـــ لێـدان: پێلپێلـووک، چکوورین. (کۆ.) مـەکووک، مرازێکی جۆلاّییـە. (باک.) چـاپلووس، مرایی.

**شەپۆلدار:** لوولـە پەڕ. ـــ ی: لوولەداری.

**شەپۆلدان:** کۆنگرەکردنی ئاو، قونگرەکردنی ئاو. لیپەدان، شڵپاوکردن.

**شەپ و شۆڕ:** شەپاڵـە، شل و شێواو، کسێکە داوێنی بەسەر زەویدا بخشـێ یا چتێکی هەڵباوەسرێ و شۆڕبێ.

**شەپیلک:** شەپک. نێسکی پشتەوەی شانییە. (هەورا.) باڵەکە.

**شەت:** چۆم، رووبـار، چـەم، ڕۆخانـە. (کـە.) دەنـگ. (ڕەوا.، سـۆرا.) خووار، چەوت، لار.

**شەتاو:** قوڕاو، لێلاو، دۆڵ، زێ، چۆمی زۆر گەورە. ئاوی سارد بەژێر زگ و گەل و گونی وولاّخی بەرزەدا کردن لـەکاتی گەرمایـەدا. ئەسپەکە ـــ کـە. داسێکی چکۆڵەیە کەوەری پێ دەدروێتەوە بەلاّم دەمی لە دەرەوەیە بە واژی داسی.

**شەتەرە:** شاتەرە.

**شەتەک:** قایم. ـــ دان: قایەکردن.

**شەتەکدان:** قایکردن، پێچانەوە و بەستنی چتێک بە توندی.

**شەتەلی** (ئەردە.): شەتڵ.

**شەتەن** (ئەردە.): تەناف، گوریس.

**شەتەندان** (ئەردە.): سفتکردن.

**شەتەو:** بڕوانە: شلەپەتە.

**شەترەنج:** شەترنج.

**شەترنج:** شـەترەنج، سـەترەنج، شەشـڕەنگ، گەمـەیـەکی دیـار و ناسراوە لـەپێشدا نێـوی شەشڕەنگ بووە، کـە بـە تیپی ئـارەوی نووسراوە بۆتـە شـەترنج لـە لای ڕاستەوە: شا، فەرزین (وەزیر)، فیل، ئەسپ، ڕوخ، پیادە.

**شەتڵ:** (خۆ.) شتل. ئەشتر، سەوزاییێکە لەشوێنی خۆی هەڵکەنرابێ بەڕیشەوە بۆ چەقاندنەوەی لە شوێنێکی تردا. ـــ چەقاندن: بریتییە لـە تۆوێکی لـە جێگایـەکی تایبەتیدا بچێنرێت لـە پـاش بەرزبوونـەوەی بـە ڕیشەوە هەڵدەکەنرێت لە جێگایەکی ئامادەکراوی تردا وەکوو گوڵ، دێراو دەچەقێنرێت.

**شەتڵەجار:** شەتڵگا.

**شەتڵجار:** شەتڵگا، جێگایەکە شەتڵی لێ بچەقێنرێ.

**شەتڵگا:** دووکانی شەتڵ، باخڵە. (ئەردە.) تۆمەدانە.

**شەتڵی ئاوی:** لە ئاو هەڵکێشران.

**شەت و پەت:** پارچەپارچە، لەت و پەت.

**شەت و پەتکردن:** پارچەپارچەکردن.

**شەت و کوت:** شەت و پەت، لەت و پەت.

**شەتوور** (باد.): شەفتوول.

**شەحە:** کورتکراوەوەی ناوی (شا محەممەد)ە، ناوی پیاوانە. *

**شەحتۆ:** بێ سەروبەر، شلەپەتە، شل و شۆڵ، (هەورا.) گێج.

**شەخەڵ:** چووزەڵـەی چکۆڵـەی دار و گیایانـە، کـە تـازە دەریـانکردبێ. (باک.) کـەم. (ڕەوا.) شۆخەڵ. (هەو.) شـەغەڵ، کارتـە، گوڵی. کـەد. (شا.) شێخەڵ. (هەورا.) چووزە. (هەو.) ئەو لقە باریک و ڕاستانەیە، کە لەبنەوەی کۆلکە و شوێنانی تر پـەیدای دەکـەن. (هەورا.) جێگایەکە پڕ لـە دار و دڕک بێ، چڕ، چڕستان، بەردەلاّن. (هەورا.) خەوش و خاڵ، زبڵ.

**شەخەلاّن** (هەورا.): شوێنێکە، کە قەڵەمی تێدا ڕووابێ.

**شەخەڵمچ** (هەورا.): زبڵڕێژ.

**شەخت:** گیاندارێکە شەلی لە هەردوک دەستا ندابێ.

**شەختاندن** (باک.): سەرەوژێرکردن. (بشەختێنە.).

**شەختە:** بەستەڵـەک، سەهۆڵ، سەهۆڵبەندان. (هەورا.) یـەخ، بەیسـە. نمی تـەڕایی و شـەی هەوایـە لـە پاییزاندا لـەسەر شیناوەردیان دەنیشـێ و لـە ساردی دەیبەستێ و شیناییەکان تێک و پەکان دەدات.

**شەختۆ:** سست، تەنبەڵ. تێکەڵ و پێکەڵ.

**شەختین** (باک.): سەرەوژێربوون.

**شەخرە** (هەو.): لە ڕستەیەکی دارینە دەخڵی پێ دەکێشنەوە سەر خەرمانان. خەرەکێکی ئاوا گەورەیە گەنم و جۆی درواوی پێدەکێشنەوە سەر خەرمانی، شەغرە. ـــ بەستن. (باک.) بەیار، بێبەر، بێ کەڵک.

**شەخس** (ع.): گۆڕی پیاوی گەورەی ئایینی. چاک.

**شەخسان**: تێکچوون و گۆڕانی ئەندامی مرۆڤ بە هۆی ناساغییێکی گرانەوە.

**شەخساو**: ئەندام تێکچوو بە هۆی ناساغییێکی گرانەوە.

**شەخسین**: شەخسان.

**شەخسیو**: شەخساو.

**شەخف**: سوواغی سەربان بە گێچ یا بە قوڕ.

**شەخڵ**: شەقڵ، نیشان و دروشمی خەرمان.

**شەدار**: غدار، نیمدار، تریووسدار، شێدار. ـــ ی: غداری.

**شەدانە**: (هەو.) حەوێنج، (هەورا.) شمڵی، شادانە، توو، گوش، بە کوتراوی تێکەڵ بە ڕشکەی دەکرێت بۆ تام و بۆنخۆشی لە پێش برژاندنیدا بە نانی وەردەکرێ. تۆوی گیای گونیە.

**شەدانکە**: کیسەی سابوونی ژنانە، کیسەی سابوون و شانەی ژنانە.

**شەدە**: هی ڕەش و سپی دێغ دێغ پتر پیاوان لەسەری خۆیانی دەنێن بەڵان هی سوور زۆرتریني ژنان دەیبەستن بە دەوری سەریانەوە. (کە.، هەو.) مشکی، (هەورا.) کێش، سەرپێچ.

**شەدەلار**: سەروپێچ لار. ـــ ی: سەروپێچ لاری.

**شەڕ**: گژنگەڵ، لەج، (هەورا.) جەنگ، (باک.) کۆماند، پیلە، ڕەزم، (هەورا.) پەرەچەنگ، پەرەچەنگی، کێشە، نەبەرد، گەڕ، (باک.) بناقێ، شیڕ. بە ـــ هاتن. بە ـــ دان: لێک ئێخستن.

**شەرا**: گڕە، لە ئادەمیزاد بدات بە زۆری دەیکوژێ. (شار.) زریان، بایەکی ناسازگاری گەرمە لە مەرەزە و هەندێک میوە دەدات ووشکی دەکات، هەر میوەیەکی ئەو کارەساتەی بەسەر هاتبێ پێی دەڵێن: میوەی شەرا بردوو، لە (٤) ی تەمموز تا (٢٤) ی ئاب دەوام دەکات و (٥٤) ڕۆژە لەساڵێدا. سووتانەوەیەکە لەگەڵ خارشت، کە لە لەش پەیدادەبێ.

**شەڕاب** (باک.): گوڵینگ.

**شەراب**: برشتی پۆلاێ. ـــ کری: ڕازاندنەوەی پۆلا بە زێڕ و زیو و خەملاندنی. مەی، ڕەنگە لە شیراب، شیراوە وەرگیرابێ.

**شەرابخانە**: مەیخانە.

**شەرابخۆر**: مەیخۆر.

**شەرابردگ**: شەرابردوو.

**شەرابردە**: شەرابردوو.

**شەرابردوو**: شەرابردە، شەرابردگ، (بابا.) میوەیەکە بای گەرم و ناساز لێی دابێ و لە کەڵکی خستبێ، شەرالێدراو.

**شەڕابی**: چتێکە ڕەنگی وەڕەنگی ـــ ی بچێ.

**شەرار**: کفت و تەنگاوی تینوایەتی.

**شەڕارۆ**: سەرکردەی جەنگ.*

**شەڕارۆیی**: سەرکردایەتی جەنگ.*

**شەڕاشۆ** (ئەردە.): شاراشۆ، کوڵەوەیولە، وەیخڕ، ئاگری بنکایە. پێکوڵچێن.

**شەرالێدراو**: شەرابردوو.

**شەڕانی**: شەڕفرۆش.

**شەراو**: مەی.

**شەراوخانە**: مەیخانە، شەراوخۆر: مەیخۆر.

**شەرەپۆپان** (ئەردە.): قژی یەکتری گرتن، پرچی یەکتری کێشان.

**شەرەت**: سەرکێش، ووڵاخی تۆسن.

**شەرە تفەنگ**: دوو یا چەند کەسێک بە تفەنگان شەڕ لە گەڵ یەکتری کردن.

**شەرە تۆپ**: دوو چینی نەیاری یەکتری لەکاتی شەڕێدا تۆپان پێکەوە دەنێن. گەمەیەکە بە تۆپی لە یەکتری دەدەن.

**شەرە تۆپەڵ**: جوورە گەمەیەکە تۆپەڵە بەفری پێکدادەدەن.

**شەرەجنێو**: جنێو پێکدان.

**شەڕەدار**: گیرودار.

**شەڕەدەمانچە**: دەمانچە پێکەوەنان، بە دەمانچان شەڕ پێکەوەکردن.

**شەڕەدەنووک**: مەبەس لەو ووردە جنێوانەیە، کە دووکەس یا چەند کەس بە یەکتری دەدەن هەر لە پاڵەوە. بووک و خەسوو هەمیشە شەڕە دەنووکیانە.

**شەڕەسەگ**: شەڕکردنی سەگان پێکەوە یا تێکبەردانیان.

**شەڕەشاخ**: قۆچانێ، قۆچقۆچانێ.

**شەڕەشەق**: زرمەلێی چەند کەسێک.

**شەڕەشۆق**: شەڕەقۆچ.

**شەڕەفخانی بتلیسی**: خاوەندی مێژووی شەرفنامەیە.

**شەرەفنامە**: یەکەم مێژوویێکە، کە لە بابەت نەتەوەی کوردەوە لە لایەن کوردێکی زاناوە بە زمانی فارسی بنووسرێ.

**شەڕەڤان**: شەڕەوان، جەنگاوەر. ـــ ی: شەڕەوانی، شەڕکردن.

**شەڕەقۆچ**: شەڕکردنی دوو گیاندار بە سەر.

**شەڕەقۆچانێ**: شەڕکردنی دوو گیاندار بە سەر.

**شەڕەقۆچەقانی**: شەڕکردن بە هاویژتنی بەرد بە قۆچەقانی.

**شەڕەک** (گەر.): گوریسی ڕەشماڵانە.

**شەڕەگەڕەک**: شەڕکردنی منداڵی دوو گەڕەکان لەگەڵ یەکتری.

**شەڕەنگێز**: شەڕ هەڵاییسێن.

**شەڕەنێزە**: بە نێزە بەگژ یەکتریدا هاتن.

**شەریات** (باک.): داردەست.

**شەربە**: تونگە، قومقومە، بقبقە. شەربک لە گڵ دروستکراوە بۆ ئاو خواردنەوە.

**شەربەت**: شیلەی چتی شیرین، کە لەگەڵ ئاوێ تێکەڵ بکرێ بۆ خواردنەوە و خواردنەوەمەنی.

**شەربەتچی**: شەربەتفرۆش.

**شەڕ بەرپاکردن**: شەڕ هەڵاییساندن.

**شەڕبەشاڕان:** شەڕفرۆش، سەربەگۆنگەڵ.

**شەڕبەفرۆش:** کەسێکە پیشەی شەڕبەفرۆشی بێ.

**شەڕبەفرۆشی:** پیشەی فرۆشتنی شەربە.

**شەڕبێک:** شەربە.

**شەڕپەرست:** شەڕانی.

**شەڕپەرستی:** حەز لە شەڕکردن.*

**شەڕپەزە** (باک.): شپرزە.

**شەڕپلاندن:** سەرگەردانکردن. واق وڕکردن.

**شەرت:** پەیمان، بەن و بە سوباتی. مەرج، گرێو، فتور.

**شەرخە:** شەلغە.

**شەڕخۆر:** پارێزەر. ــ ی: پارێزەری، شەڕکری.

**شەڕخووار:** شەڕفرۆش. ــ ی: شەڕفرۆشی.

**شەردانن** (باک.): دابێژتن.

**شەردین** (باک.): دابێژران.

**شەرشووب:** گوڵنگە لە زێڕ و زێو دروستەکرێ ژنان بەسەر کەزی خۆیانەوە دادەکەن.

**شەڕفرۆتن:** شەڕفرۆشتن.

**شەڕفرۆش:** (هەورا.) جەنگ و ورەش. جەنگاوەر، گەلشۆک.

**شەڕفرۆشتن:** مەبەس لە بیانوو گرتنە بە یەکێکی بۆ ئەوەی، کە بە گژی دابێت، شەڕفرۆتن.

**شەڕفرۆشی:** شەڕەوانی.

**شەڕڤان:** کەسێکە لە شەڕێ بزانی.

**شەڕقاڵ:** جێگای نزم و کورت لە چیایاندا وەکوو چیای ژەنگاری لە گۆرانیاندا باسیکراوە.

**شەرقەشەرق** (باک.): دەنگی لقی دارانە.

**شەرقاندن:** لێکردنەوەی چتێک لە شوێنی خۆی.

**شەرق** (فە.): سواخ. ــ کردن: سواخ کردن.

**شەرقین** (باک.): تەقە، رەقە. دەنگی وێک کەوتنی دروچتانە.

**شەرک:** کۆشەوە و خەبات.

**شەڕکەر:** جەنگاوەر، شەڕۆکەر، شەڕڤان، بجەنگ، شەڕۆک.

**شەڕکردن:** شەڕەڤانی، شەڕەوانی. لەهەڤکەتن. بەرزاندن، (باک.) پەرەچەنگێ کرن.

**شەڕگە:** (هەورا.) جەنگگا، جێگەی شەڕ، کووشەنگە.

**شەڕگەم:** (ئامێ.) کات، جەنگە. ــ ا گەرمێ: جەنگەی گەرمایە.

**شەرم:** شوورەیی، ئابڕوو، ئاوڕوو، کەم ڕوویی، (باک.) فەهێت، پۆت. چاوەڕوو. فەدی، فهێت. بە ــ داخستن: پۆتخستن. بە ــ: پەردەنشین، بە شێواز، کەم ڕوو، شەرمێوون، ئابڕوودار، گرانڕوو، ئاڤڕوودار، شەرمدار، شەرمەندە. ــ داکەوتن: پۆت کەوتن. بێ شەرم: ڕووقایم، ڕووسەخت. حەیتە، زرزۆپ، باتیزۆ، ڕووڕەش، بێ چاوەڕوو، چوختی، چەختی(باک.) بەقلیسۆک، (هەو.) شەپاڵ، بەینەشە، پیسوا، قاڵ، بێ فەهێت، شازدە هەناسە، جەرەبەزە، قەڵتەبان، کەولی. بێ ــ ی: بێ ئابڕوویی، پەستی، سووکی، حیزی، شیرەت، نخایی. ــ نەکردن: ڕووهێنان، ڕوو هەڵاوێژتن.

**شەرمە** (ئەردە.): شەرم.

**شەرمەزار:** فەریکار، چاوشۆڕ، چاوبەرەژێر، تەریق، چاوەخووار، بێ ڕوو، شەرمەسار، چاولەبەر، تەریق بۆوەوە. ــ بوون: چاو لەبەرخۆنان، بوونەئاو، پۆتکەتن. ــ کردن: پۆتخستن.

**شەرمەزاری:** پۆت، تەریقی، چاولەبەری.

**شەرمەسار:** شەرمەزار، تەریق.

**شەرمەساری:** شەرمەزاری، تەریقی.

**شەرمەشکانێ:** مەبەس لە خۆنواندن و خۆدەرخستنی یەکێکییە، کە بیەوێ شەرمی خۆی بشکێنی.

**شەرمەنە:** شەرمەندە.

**شەرمەندە:** شەرمەزار. ــ یی: شەرمەزاری.

**شەرمخاندن:** (باک.) (بشەرمخینە). خوراندن، ڕنین، داڕووشاندن.

**شەرمخین** (باک.): داڕووشان، ڕنران، خوران.

**شەرمدار:** شەرمن، باشەرم، شەرمێوون. ــ ی: شەرمنی.

**شەرمسار** (ئەردە.): شەرمەسار. ــ ی: شەرمەساری.

**شەرم شکان:** لە ڕووهەڵاتن.

**شەرمشکاندن:** ڕووکردنەوە، چاوکردنەوە.

**شەرمکردن:** (خانە.) ڕووکردن. ڕوونەهاتن، لە ڕووهەڵنەهاتن.

**شەرمگا:** نێوانی نێوک و چۆکانە و پشت و چۆکانە.

**شەرمگە:** شەرمگا.

**شەرمن:** شەرمێوون، بێ ڕوو، کەسێکە بەشەرم بێ، شەرمندە. ــ ی: شەرمێوونی، بێ ڕوویی.

**شەرمنە:** شەرمندە، شەرمن، شەرمەسار.

**شەرمندە:** شەرمەنە، شەرمن. ــ یی: شەرمێوونی.

**شەرمۆک:** گیایەکە دەست لە هەر گەڵایەکی بدرێ شۆڕدەبێتەوە. ئابڕوودار، شەرمێوون، ئابڕوومەند، شەرمن.

**شەرمۆکی:** شەرمێوونی، ئابڕووداری.

**شەرمۆلا:** گۆڕستانێکی بەناوبانگی شاری ئامووردێ (عامووردێ) یە.

**شەرمینی** (خۆ.): مەیخۆش (بۆ هەنار دەبێ).

**شەرمێوون:** شەرمۆک، شەرمن، بەشەرم، بێ ڕوو، کەم ڕوو، فەهێتۆ، فهێتو. ــ ی: شەرمنی، بەشەرمی.

**شەڕناخێوی:** شەڕنەخێوی. شەڕنەخ. کلیلە. سووارسووارێن. تەڕاد. تەڕات، تەڕاتێن، غارغارێنی سووارانە لەپێش بووک و ئاهەنگاندا. شەڕەخێوی، ڕمبازی. ــ کردن: کەتنە تڕادێ.

**شەڕنانەوە:** شەڕ هەڵگیرساندن، شەڕ هەڵایساندن.

**شەڕنەخ:** شەڕنەخێوی.

**شەڕنەخێوی:** شەڕناخێوی.

**شەڕۆ:** کورتکراوەی ناوی (شەریف)ە.*

**شەڕۆکەر** (باک.): شەڕکەر.

**شەروال** (هەورا.): شالوار. پانتۆل. دەرپێ. (هەورا.) پاوارە.

**شەروال بەکۆل:** گیایەکی بەهاری سەلکدارە گەلای وەک هی شاتەرە وەتامی وەک شێلم وایە خواردنی بۆ رەوانی باشە.

**شەروالپیس:** داوێن پیس. ـ ی: داوێن پیسی.

**شەرۆیی:** (باک.) شپرزە.

**شەروبنار** (دزە.): کێشە، شەروکێشە.

**شەرووت:** (باک.) شەکەر.

**شەرووتڕ:** شەڕ و هەرای بێ جێ.

**شەرو وور:** رووش، قۆڵتش، شیرەت ـ توند. بێ شەرم.

**شەرووڕەش** (هەورا.): شەرفرۆش.

**شەروشۆڕ:** هەراهەرا.

**شەروکێشە:** بچەنگانێ، (دزە.) شەروبنار، خرەپیچک، مەخسەرە، پیلە.

**شەرهەلایساندن:** ئاگری شەرکردنەوە.

**شەرهەلایسێن:** ئاووری بنکایە، شەرداگیرسێن.

**شەرهەلگیرساندن:** شەرنانەوە، کێشە و هەرا بەرپاکردن.

**شەرهەلگیرسێن:** کەسێک کە دەبێتە هۆی هەلگیرسانی شەر. *

**شەرهۆملکێ:** هەراوهۆریا کردن.

**شەریک** (ع.): هاوبەش، بەش بەر، هاودەس، هاوماڵ، ماڵ لەیەک.

**شەری ناوخۆیی:** شەرێکە لە نێو خێزانێک یا تیلێک یان نەتەوەیەکیدا روودات.

**شەز** (باک.): گۆرانی بەهارییە.

**شەس** (شەسس): شەست. کەس.

**شەست** (هەورا.): شێست نێوە بۆ ژمارەیەکی، کە (٦) جار (١٠) و (١٢) جار (٥) ە.

**شەست نەکا** (هەورا.): شێستە بارانە.

**شەستە:** مانگی نیسانییە، کە (٣٠) رۆژە. شەستەباران.

**شەستەبارانە:** شێستەبارانە، شەستە.

**شەستەپەڕ:** شێست پەڕ (گوڵێکە).

**شەستەدان:** رێک کردن و تەختکردنی زەوی کێلراو.

**شەستەرەهێڵە:** شەستەبارانە.

**شەستەکردن:** گۆلگۆلکردنی زەوی بۆ (وونار) بۆ ناژتنی توتن.

**شەستەم:** چتێکە لە پایەی سەدیدا بێ. ـ ین: شێستەمین.

**شەست تیر:** چەکێکی شەرییە شێست گوللەی دەخوات.

**شەستەمین:** شێستەمین.

**شەست پەڕ:** شێست پەر گوڵێکی زەردی بۆنخۆشە و تۆپە وەکوو گوڵە جوورییە بەلام نەم گەورەترە.

**شەستکردن:** بەرێژنە بارینی باران. *

**شەستکلاوبەسەر** (زەن.، هەورا.): بارانەی سەربەکلاوە، بارانەی سەربەقەپووچکە.

**شەستهەم:** شەستەم.

**شەستهەمین:** شێستەمین.

**شەست یەک:** شێست یەک.

**شەستیر:** شێستیر.

**شەسس:** شێست. (ئەردە.) قامکە گەورە. (ئەردە.) رەهێلەباران، رێژنەباران.

**شەش:** ژمارەیەکە لە نێوانی پێنج و حەوتی دایە.

**شەشدەرب** (باک.): دەمانچەی شەش ئاگر. من دەستدا ـ ا خۆ: دەستمدا شەش ئاگرەکەی خۆم.

**شەشێ بێدارە:** کەسێکی بێدارە.

**شەشکردن** (ئەردە.): شەستکردن.

**شەش:** (هەورا.) شش.

**شەش ئار:** شەش ئاگر.

**شەش ئاگر:** دەمانچەیەکە شەش گوللەی دەخووا، شەش ئار، شەش لوول. ـ ئاووردان: ـ ئاوێژتن.

**شەشە** (گەر.، باک.): شەوە. شەش کلک. کەسێکی دەستی یا پێی (٦) قامکی هەبێ. شەش قامک، شەش ئەنگوست.

**شەشەک:** شەشەکان.

**شەشەکان:** (کە.) شەشەلان، شەشەلە. شەشەک. شەش رۆژەکانی دووای جێژنەی مانگی رۆژووانە.

**شەشەلان:** شەشەکان، مانگی دووای مانگی رۆژووانە، کە دووای رۆژی جەژنی رۆژووان (٦) رۆژانیش بەرۆژوو دەبن.

**شەشەم:** چتێکە لە پلەی شەشەمدابێ.

**شەشەمین:** شەشک. ژمارەیەکە ژمارەی شەش تەواو دەکات.

**شەشپا:** شەشپێ، گیان لەبەرێکە خاوەندی شەش پێیانە.

**شەشپالوو:** شێوەیەکی رێکە، کە شەش رووی یەکسانی هەیە، شەشگۆشە.

**شەشپەڕ:** جوورە جۆیەکە گوڵەکەی هەشت پەز دەنکی تێدایە. جوورە گوڵێکە. داردەستێکیشە نەستوورە، کە بزماری درشتی لەسەر کوترابێ.

**شەش پەنجە**(کە.): خاوەندی (٦) قامکان.

**شەش تیر:** شەش ئاگر.

**شەشخان** (کە.): جوورە تفەنگێکی کۆنەیە و دێغدێغە. (باک.) شەشخانە.

**شەشخانە:** جوورە تفەنگێکە لە ناوەوە شووێنی فیشەکی هەبێ. هەموو زەوی وزارێکیش بە (٦) دانگ دادەنرێ.

**شەشدانگ:** زەوی وزارێکە هیچ بەشێکی لێ جودا نەکرابێتەوە. گوێدرێژ و ئێستری چووارپەل قەوی بەرزی بەخۆوە.

**شەشەر:** شەشلا، هەر شەشلاکە بریتییە لەسەر وخووار و راست و چەپ و پاش و پێشەوە. بۆ خانوو و زەوی بەکاردەبرێ.

**شەشەرب** (باک.): دەمانچەی شەش تیرە.

**شەشرەنگ:** بروانە: شەترەنج. *

**شەش سەد:** شەش جاران سەد.

**شەش سووچ:** شەشلا.

**شەشک** (باد.): مێژەر. (باک.) شەشەمین، شەشەلاَن.

**شەشکان:** شەشەلاَن.

**شەشکلک** (ئەردە.): شەشە، شەش ئەنگوست.

**شەشگۆشە:** شەش سووچ.

**شەشلا:** شەشدەر، شەشقۆلّ. شەش سووچ.

**شەشلۆ:** چتێکە شەش لۆ، (٦) لا بێ.

**شەشلۆبە** (باک.): دەغەلّ، ساختەچی. ـــ یی: دەغەلّی، ساختەچێتی.

**شەشلوول** (ئەردە): شەش ئاگر.

**شەشۆ:** شەشە، ناوی دێیەکیە لە کوێستانی کوردستانێدا و ناوی کوڕانیشە.

**شەشهەزار:** شەش جاران هەزار.

**شەشهەم:** شەشەم.

**شەشیەک:** یەک لە شەشان، لە شەش بەشان بەشێک.

**شەشهەمین:** شەشەمین.

**شەشیەکی:** لەشەش بەش بەشێکە میراتگر دەیبا.

**شەعبەدە:** (ع.) تەردەستی، چاو بەسی، چاو بەنی، جانقولی بازە.

**شەعموز** (زا.): وولاَخی سەرکێش.

**شەعن** (زا.): بزنی بەلّەک.

**شەغەلّ:** شاخەلّ.

**شەغرە:** شەغلّە، شەخرە. چوارلینگەدارە وەکوو بەردکێش قرشەی پێ دەبەستنەوە.

**شەغرەکێش:** ئەو کەسەیە وولاَخی وا لێدەخوڕێ، کە شەغرەی دەکێشتەوە. جوورە دەستەبەرەیەکە شەغرەی پێدەگووێزرێتەوە.

**شەفەلاح:** شێڤەلە، شەفەلە.

**شەفەلە** (کەبەر): شێڤەلەتە، گیایەکە لەگەلّ سیری جووان دەکوترێ و لەسەر شووێنی باداری دادەنرێ، ئەم گیایە پتر لە کاولاندا و لە چۆلی بێ ئاودا شین دەبێ بەرەکەی بەقەد سێوێکی دەبێ، کە بەرەکەی پشکووت زەنگەسوورە و چتی وای لەسەر هەلّدەنیشێ و دەیخۆن شیرینە و شیرەی هەیە. ئەگەر ڕەگەکەی بکولێنرێ و دۆشاوەکەی بە جێگای باداری بدرێ یەکاویەکە. دەلّێن، کە ساقەتەکەی ووشک بێ دەبێتە دار.

**شەفت** (باک.): خەت، جزغ، دێغی کالاَ و چتمەکان. خووار، چەوت.

**شەفتالوو:** خۆخ. (ل.) هەلّووژەسیقەتۆرە.

**شەفتە:** پنجە گیایەکی درواوییە و گوڵی سپیە دووای ووشک بوونی تۆیی گولّەکەی مێشوولەیەکی زۆر دەردەکات.

**شەفتر:** پیرێ شەوێ.

**شەفتۆر**(ئەردە.): خووار، لار، کەچ.

**شەفتوور** (ئەردە.): شەفتوول.

**شەفتوول:** خووار، زەوی درێژکار و سووچەکانی ڕێک نەبێ. خووارایی ڕێگایان، گەوە. درووماتی مارپێچ.

**شەفتێ** (باک.): جزخ، دێغ، دێخ.

**شەفتی:** خوواری، لاری، چەوتی.

**شەفشە:** شوولی پەرەکەر و هەلاجان.

**شەفقە** (باک.): شەپکە.

**شەڤ** (باک.): شەو. ـــ ئاتە خووەش: شەوباش. ـــ لمن گەڕیایە: شەوێ نەنوستم.

**شەڤان** (باک.): شەوان.

**شەڤە** (باک.): شەوە، خەونی پەرێشان.

**شەڤەدەر:** شەوەدەر، شەومانەوە لە دەرەوە.

**شەڤەرەش** (باک.): شەوی تاریک.

**شەڤەستان** (باک.): شەوی پەردە. کاتی پێک گەیشتنی زاوا و بووک.

**شەڤ بهنک** (باک.): شەوبۆ.

**شەڤبێری** (باک.): شەونشینی.

**شەڤتر** (باک.): پیرەشەوی.

**شەڤترادی** (باک.): سێ شەو لەوەپێش.

**شەڤچەرین** (باد.): شەوچەلە.

**شەڤخشک** (باد.): کالیار.

**شەڤخوونی** (باد.): شەبەیخوون.

**شەڤخووین** (باک.): شەونخوونی. لەپڕرا بەشەو بەسەر ناحەزان دادان.

**شەڤدەر** (باک.): بێ پەنا، کەسێکە لە چۆلی و دەشت و کۆلانان بێ واتە لە نێو مالاَندا نەبێ. ـــ ی: بێ پەنایی.

**شەڤدەست** (باک.): ڕاوی کەوان کردن بە شەو.

**شەڤرەش** (باک.): شۆڕش، بەدبەختی، چارەڕەشی، ڕۆژی تاریک، کوردان دەلّێن: ئێمە گەلێک شەوی ڕەشمان دیتوە و گەلێک شەوی ڕەشمان بەڕێکردووە، شەوی ڕەشمان گەلێک بەسەردا هاتووە.

**شەڤرەشکی** (باک.): شەوکوێر.

**شەڤرەڤیک:** شەمشەمەکوێرە.

شەڤرەڤیک

**شەڤرۆنگ** (باک.): یەکێکە لە جەژنەکانی یەزیدیان.

**شەڤسازی** (باک.): ئاهەنگ و بەزم و ڕەزمی شەوێ.

**شەڤشەڤۆک** (باک.): چەکچەکیلکە.

**شەڤکوێر** (باد.): شەوکوێر.

**شەڤگەڕ:** شەڤگێڕ، شەڤگێڕۆ، ڕم تۆیۆ، باران باری، ئەو کەسەیە بەشەودەگەڕێ، ئازا.

**شەڤگێڕ** (باک.): کەسێکە بەشەو لەکاتی نووستنێدا باخووێ و بگەڕێ.

**شەڤناتۆروان** (باک.): شەونشین.

**شەڤنم** (باک.): شەونم.

**شەڤنقستی:** کەسێکە شەوی بەنوستن ڕۆژبکاتەوە.

**شەڤی** (زا.): شەوارۆ.

**شەڤین:** ئالیکی شەوێی وولاَخ و ئاژالاَنە.

**شەق:** دەفەی جۆلاَ. (هەورا.) پێن. زیتک، شاپ، شەپ. ـــ لێدان: بەپشتی پێ لە قون یا جێگایەکی کەسێکیدان، شەپ لێدان، تێهەلّدان.

نەژاکاو، نەگەچراو، گوڵ و کاڵای نەژاکاو. لەت، دوو پارچە، تەق، قەد. ـــ بوون: پچەڕان، قڵیش. ـــ کردن: لەتکردن، قەڵەشتن، تەق کردن. (ئەردە.) سەرەمەرگ، نزیکی مردن. (خۆ.) زللە، شەقەزللە. (باک.) شەقشەق ئەو دەنگە لە گەڵێک چتان دێ: بووە شەقشەقەی ددانی بارامی، بووبە ـــ لنگی وی و ئەسپی وی وە بە ئاوەزنگیانیدا، ـــ تفەنگان. (باک.) دارشەق، دارلوق، دارێکە مرۆی یەکلاق و پا شەڵی پێ دەڕوات. چەوتەکی مێو. بە پشتی پێی ڕووت یا لە قۆنەرەدا تێهەڵدان.

**شەقە:** شەق، شل.

**شەقار:** قەڵەشت، قڵیشی چت، تلیش، (ئەردە.) هەلار.

**شەقارشەقار:** قەڵەشت قەڵەشت، قلیش قلیش، چتی زەنگ زەنگ، هەراڵ هەراڵ، ووردخاش، (ئەردە.) ووردوخان.

**شەقارشەقاربوون:** قەڵشینی پێستی ئەندامی مرۆڤان و ئیتر.

**شەقارشەقارکردن:** قەڵشاندنی پێستی ئەندامی مرۆڤان و ئیتر.

**شەقازللە:** شەقەزللە.

**شەقاشەق** (ئەردە.): شەقشەقە. شەقای شەق. ئەملاوئەولا. بەهەموولایەکیدا غاردان.

**شەقاقلووس** (ئەردە.): خۆرە.

**شەقاقی:** شقاقی، شوقاقی.

**شەقاڵ** (باک.): کەوشی کۆن، پێڵاوی کۆن. چەقاڵ، چەقاڵ و بەقاڵ.

**شەقام:** ڕێگای زۆر بەرین و ڕاست بە نێو شار و هەندەراندا، شەقاو، شارێ، شارێگە. لۆق، شەقاو، هەنگاو، شاقاو. (زا.) گاو، پێنگاڤ.

**شەقان** (کە.): شەقێن، چەوگانێن، جوورە گەمەیەکە.

**شەقانشەق:** سەرانسەرە لە کارانی گرنگ و بە ئەرکدا، تێکڕا، بەبێ ووچان.

**شەقاو:** هەنگام، هەنگاو.

**شەق و شەق** (ئەردە.): شەڕەشەق، شەقشەقێن، شەقشەقان، شەقواشەق.

**شەقە:** تیکە، پارە، لەخت. تەقە، دەنگ. دەفە، شانەی جۆڵایی. چێو، گۆچانێکە مرۆی شەل وەژێر پێی خۆی دەدات. دەنگی باڵی باڵندانە لەکاتی فڕینێدا.

**شەقەبەند:** ڕەختی ووڵاخ، ڕەخشی ووڵاخ.

**شەقەزللە:** چەپاڵە، زللە، شەپ، شەپەلاخە، شەقازللە، شەپاڵە، شەپەلاخە، چەک.

**شەقەزیلە:** شەقەزللە.

**شەقەشەق:** چەق و چۆق، چۆقەچۆق، چرقەچرق، شەقەی یەک لە دووای یەکتری.

**شەقەکردن:** لەتکردنی تاکە چتێک یا زۆر بڕەدار و ئیتر بە هۆی شەقەوە.

**شەقەکێش:** ئەو کەسەیە، کە پیشەی هەر داران بە شەقەی شەق کردن بێ.

**شەقەگل** (ئەردە.): گل کردنی چاو. چاو ئێشە.

**شەقەماسی:** جوورە ماسییەکی گەورەیە.

**شەقەمشار:** هەڕە، مشارێکی زۆر گەورەیە و دوو دەسکی هەیە و بە دووکەسان کاری پێدەکرێ، داری پێدا دەهێنرێ.

**شەقەمێو:** چەوتەکی مێو، دارەمێو.

**شەقەوباڵی** (هەورا.): شەقەی باڵ.

**شەقەی باڵ:** دەنگێکە لەکاتی فڕینی باڵندە و باڵ لێکدانیدا دەبیسترێ.

**شەق بردن:** تەقین، تەقبردن. قەڵشین، قەڵشان. درزێکی گەورە تێبوون. هەڵپچڕان، درزبردنی چت.

**شەق پێ بردن:** ڕق هەڵستاندن، داخ لەسەر دڵی کەسێ دانان.

**شەقتاندن** (باک.): هەڵوەشاندن، کردنە دووپارچە.

**شەقتێهەڵدان:** بەشەق لە گیان لەبەر یا لە چتێک هەڵدان، تێهەڵدان.

**شەقتین** (باک.): هەڵوەشان. بشەقتە.

**شەقڕان:** شڵەقان.

**شەقڕاندن:** شڵەقاندن.

**شەقشەقان:** شەقاوشەق.

**شەقشەقە:** فرفرە، باغەوان بەو دەنگە، جانەوەران لە باغی ڕاودەنێ.

**شەقشەقە** (بابا.): جوورە ترێیەکە گلووی وەکوو هی کشمیشی وایە و سپیە. تەنەکەیەکی چکۆلەی دەسکدارە منداڵان بەڕاوەشاندن و هەژاندنی و شەقەشەق لێهاتنی خۆشیان لێدێت و پێی ژیردەبن، تەنەکەیەکە چەند زیخ یا وورده بەردی تێدایە.

**شەقشەقۆک** (گەردی باک.): گەپڵە، گیایەکە.

**شەققە:** دەنگێکە لە نێوانی شلپە و تەقەدایە بەلاّن زۆرتر بەدەنگی جووتە باڵ لێکدانی باڵندان بەکاردەبرێ، شەقەی باڵی هات و فڕی. شەقەمشار.

**شەقکردن:** لەتکردن و قەڵشتنەوەی هەندێ چت.

**شەقل** (باک.): زللە. شەقڵ. چاپ. ـــ کردن: چاپکردن.

**شەقڵ:** نیشانە، درووشم، مۆر. مۆری خەرمانان. تەختەیەکی نەخشکراوە شەقڵی پێ لە خەرمانان دەدرێ تا دزی لێ نەکرێ. ـــ کردن: مۆرکردن، درووشم لێدان، نیشانەکردنی جۆخین. ـــ شکاندن: مۆرشکاندن. مۆری ڕوخسار و شەرمی ناسک و نازداران.

**شەقڵاوە:** شارۆچکەیەکی هاوینە هەوارە لە کوردستانی باشووردا.★

**شەقڵە:** تەختەیەکی نەخشکراوە خەرمانی پێ نەخش دەکرێ. قیسپی خانووانە. (دەر.) ئالووداڕ.

**شەقڵچی:** ئەو کەسەیە، کە سەرخەرمانان نیشانە دەکات و ئاگاشی لێیان دەبێت.

**شەقڵشکان:** مۆر شکانی خەرمان و چتی تر.

**شەقڵشکاندن:** بریتییە لە ئابڕووبردنی یەکێک و شکاندنی لەناو مەردووماندا.

**شەقڵکردن:** نەقش و مۆرکردنی خەرمانیە. شەقڵ. مۆر.

**شەق واشەق** (ئەردە.): شەقشەقان.

**شەق و پەق:** پارچەپارچە، لەت و پەت. ـــ کردن: پارچەپارچەکردن.

**شەق و ماق:** کارسات، گێچەڵ، ڕووشە.

**شەق و شڕ:** چتی شڕی لەق بوو، دڕاو، درپاگ، داوەشیاگ.

**شەق و شۆق:** لەق و لۆق. وە ـــ خستن: لەق و لۆق کردن. دەنگی لێدانییە. چتی شەق و شڕ. تراق و ترووق.

**شەقۆق** (باک.): شەقووک. پەنا، دالْدە، پەسیو. هەرمێ کێویلە.

**شەقووق:** درەختی قەزوانی زڕ.

**شەق و هۆڕ:** شەقەشەقی زۆر.

**شەقین:** (کە.) شەقان. هۆلین، گەمەیەکە گۆی تێدا ڕادەپەڕێنن. گۆییێن. گۆیەکی خڕی دارین لە دەشتێکی دادەنێن هەر دەستەی بە دارێکی چەماوەوە هەوڵدەدات بۆ ئەوەی لەسەر شاری دەستەکەی ترەوە دەری بکات.

**شەقی** (باک.): ماندوو، شەکەت. (باد.، ژەن.) ماندوو. — بوون. — کردن.

**شەقیقە** (ع.): لای سەر، نیوەی سەر، نەخۆشییەکە لە نیوەی سەریشدا پەیدابێ — ی پێدەڵێن.

**شەقیف** (باک.): قەڵشت.

**شەقیلە:** پارچە چەرمێکە ژنان بەلای ڕاستی خۆیانیانەوە دەگرن تا تەشی لەسەر بابدەن تا جلکەکەیان نەدڕێ و هەم تەشیەکەش باش بخولێتەوە.

**شەک:** بەرخی یەکساڵەیە نێر بێ یا مێ. کاوڕی دووساڵانەیە نێر بێ یا مێ. کاوڕ، کە گەیشتە یەکساڵی تا دووساڵان شەکی پێدەڵێن. ڕوویەکی میچ(جک) یە، شەگ.

**شەکار** (باک.): مێرگ. شکار، ڕاو.

**شەکال** (باک.): کەوشی گەورە و زەلام، کەوشی دڕاو، پێڵاوی پانیەی پشتەوە، کەلاش.

**شەکان:** تەکان.

**شەکانەوە:** هەژان، جووڵانەوە پتر بۆ ئالا، ئالا بە با دەشەکێتەوە، لەرانەوە.

**شەکاندن** (هەو.): هەژاندن، شانازی کردن. خۆ بە شۆخ نیشاندان. تەکاندنەوە.

**شەکاندنەوە:** هەژاندنەوە، هێنان و بردنی چتە بە هۆی باوە، دارەکە با دەیشەکێنێ، لەراندنەوە.

**شەکانن:** شەکاندن، هەژاندن، تەکاندن، لەراندن، لەرزانن. لەراندن، شەکاننەوە.

**شەکاننەوە:** شەکاندنەوە.

**شەکاو:** لەراو.

**شەکاوە:** لەراوە.

**شەکاوەوە:** لەراوەوە.

**شەکاوشەک:** شەکراشک.

**شەکە:** بەرازی مێی یەکساڵەیە. جوورە کلاوێکی تووکنە لە تووکی بەرخ دروستدەکرێ، پیاوی کۆنی عەجەمان. لەرە، تەکە، جووڵە، جەمە. — شک: لەرەی یەک لەدووای یەکتری.

**شەکەت** (هەورا.): ماندوو، ماندی، کفت. (بابا.) کەشمن، کەشەنگ. (ئەردە.) مانگ، مانیاگ. — بوون: (باک.) بەتلین. — کردن: (باک.) بەتلاندن.

**شەکەتکریاگ** (ئەردە.): (ئەردە.) مانیاگ.

**شەکەتی:** ماندوویتی، مانیاگی.

**شەکەر:** شەکەری وورد.

**شەکەراو** (ئەردە.): دڵ ئێشان، ڕەنج، دەردەسەری.

**شەکەر بادەم:** (ئەردە.) جۆرقند. قەلسی و ئیتر پرەکەن لە شەکر و بادامی کوتراو. جوورە هەڵوایەکە.

**شەکەرەتووسی:** تووسی شیرین.

**شەکەربۆرە** (ئەردە.): جوورە هەڵوایەکە.

**شەکەرپارە** (باک.): جوورە قەیسییێکە.

**شەکرپەنیر** (ئەردە.): شەکرپەنیر، جوورە شیرنیاتێکە.

**شەکەرخەن:** شەکەرخەندە.

**شەکەرخەندە** (ئەردە.): شەکرەخەنە.

**شەکەرگری** (زا.): شەکەرگریان.

**شەکەرگریان** (ئەردە.): گریانێکە لە خۆشی و شادییەوە بێ.

**شەکەرلەمە:** جوورە بسکوویتێکی کوردیە.

**شەکە:** شیکە، بەرازی مێینگەی یەک دووساڵانەیە. کلاوێکی تووکنە لەپێستی بەرخ دروست دەکرێ.

**شەکەر:** شەکری وورد.

**شەکەرۆکە:** (بابا.) کەرتەشی. سەلکە تەشی. (خو.) شەکرۆکە. گیایەکە گەزێک بلند و گوڵی شین و تۆپ دەردەکات، بنەکەی بکوترێ تا دڕکودالْی لێ جووێ دەبێتەوە دەبێتە پووشوو. جەویەکەشی لەگەڵ ئاردی گەنم و شیری بکرێتە لۆلکە لەسەر برینی تەشەنەدار دانرێ چاکی دەکاتەوە. کورێکی ترک زمانانی ئێرانییە بەرگی کچانی لەبەردەکەن و سوورا و وسپیاوی پێدەکەن و چەقەنەش لەدەستدەکەن لە نێو کۆڕی لۆتیاندا هەڵدەپەڕێ و چەقەنەی لێدەدا باب و مام و برا و ئیتری دەبەکی بۆ لێدەدەن پاش ماوەیەکی یەکەیەکە سەردەکاتە سەرکۆشی هەموویان، خۆم دووراودوور دیتومە.

**شەکەری:** بۆ چتێک بەکاردەبرێ ڕەنگی یا تامی وەهی شەکری بچێ.

**شەکەشەک:** دەنگی دروو و دارێنێکی دڕاوە، کە تەکەتەکی بێ، چەکەچەک، شەکوشۆک.

**شەکەڵ:** ڕانێکە هەمووی شەکەنێر بێ.

**شەکەلەمە:** (باک.) باقسمات. پسکوویت.

**شەکەمەڕ:** شەکەمێ.

**شەکەمێ:** کە گەیشتە دووساڵان دەبێتە بەردیل، بەرخی مێیە، کە پێی نابێتە ساڵی دووهەم و زگێکی کردبێ.

**شەکەمێنگە:** شەکەمێ، شەکەمەڕ.

**شەکەنێر:** شەکی نێری دووساڵانەیە، بەرخەنێرێکە پێی نابێتە ساڵی دووەم.

**شەکر:** شەکەر. قەن، قەند، کەللەشەکر. بە بەڵێن و پەیمان و قسەی خۆشیش دەڵێن. — ی وورد: شەکری هەوورد، چتێکی سپی یا زەردی زۆر شیرینە و خۆشە لە قامیشی شەکری یا جوورە چەوەندەرێکی دروست دەکرێ.

**شەکراو:** قەنداو، ئاوێکە بەشەکری شیرین کرابێ. شیرینی ژنخوازتنێ.

**شەکراوخوواردنەوە:** مەبەس لە خوازبێنی کردنی یەکێک بۆ یەکێکییە و بەو بۆنەیەوە شەکراو دەخورێتەوە.

**شەکرە:** جوورێکە لە گیای گووین، کە پێی دەڵێن جەباری. شەکرۆکە.

**شەکرەباوی:** (با.) چووالە.

**شەکرەپیاو:** پیاوی خۆشخووی زمانشیرین.

**شەکرەتووس** (ئەردە.): تێسووی شیرین.

**شەکرەخەنە:** شەکرەخەندە.

**شەکرەژن:** ژنی خۆشخووی زمانشیرین.

**شەکرەسێو:** جوورە سێوێکی شیرینە. نێوی ئافرەتانە.

**شەکرەگووین:** جوورە گووێنێکیشە کەتیرەی لێدەگیرێت.

**شەکرپارە** (دزە.): جوورە دروومانێکە بە نەخش وەکوو گوڵ هەڵدەکەوێ.

**شەکرپەنیر:** جوورە نوقڵێکی پانە لە شەکر دروست دەکرێ و کاکڵە گوێزێکی دەخرێتە سەری.

**شەکر خەنە:** شەکرخەندە.

**شەکرخەندە:** زەردەخەنە.

**شەکردان:** قەندان، دەفرێکی تایبەتییە هەر شەکری تێدەکرێ.

**شەکردانک** (باک.): قەندان.

**شەکرشکاندن:** مەبەس لە قسەکردنیشە.

**شەکرشکێن:** قەندشکێن، چەکوچێکە قەندی پێ بشکێنرێ. کەسێکە پیشەی هەر قەند شکاندنبێ.

**شەکرلەمە:** جوورە خواردەمەنییەکە لەشەکر و گوێز و ئارد دروستدەکرێ.

**شەکرۆک:** شەکرۆکە.

**شەکرۆکە:** کەرتەشی، شەکەرۆکە، چتێکی شیرنچکە لە کارتەش پەیدا دەبێ، جوورە کەتیرەیەکی شیرینە و خۆشە لە درووی گیای کەرتەشی پەیدا دەبێ، زۆر سوود بەخشە بۆ هەندێ نەخۆشی و برین. (هەو.) نوقڵ، شیرنیات.

**شەکروشیر:** شیروشەکر.

**شەکشەکان:** لەرەلەرەی چت بەدەم باوە.

**شەکمەر:** شەکمێیە، کە زگێکی کردبێ.

**شەکۆ:** بێڵێکی ئاسنی چکۆڵە و دەمپانە تەنها لەناو چۆمانی تەنکدا ماسیانی پێدەگرن چونکوو، کە بەو بێڵەیان لێدرێ ماسیان وەسەرئاو دەخا و برینداریان دەکات.

**شەکواشەک** (ئەردە.): شەک و شۆک.

**شەکۆک** (باک.): هەرمێ کێویلە.

**شەک و شۆک** (ئەردە.): شەکواشەک، شەکشەکان، شەکەشەک، جووڵەجووڵ، لەرەلەر.

**شەکێن:** گەمەی قاپێن.

**شەکینەوە** (ئەردە.): دانەدوواوە، لەرپوون. شکان، لەریانەوە، لەرینەوە. جووڵانەوە.

**شەکی کاڵ:** شەکمێیە، کە هێشتا نەزابێ و زگی نەکردبێ.

**شەکیلە** (کۆ.): چەکچەکیلە.

**شەکیکە:** ووشەیەکە چتی تەڕی شەپ و شۆڕی وێدەچووێنرێ.

**شەگە:** شەگگە. لەکاتی جگێنێدا لە لاتەنیشتەکەی جگی نەوی قۆرت و چاڵی هەیە بکەوێتە لای سەرەوە ــ ی پێدەڵێن.

**شەگگە:** شەگە بۆ ڕۆژباش، ئێوارەباش و شەوباش بەکاردەبرێ لەجیاتی مەرحەباشە. لە بنچینەدا واتا یەکەی ئاوایە: پایەو جێگات وەکوو هی پادشایان بێ.

**شەگەل:** مێگەلێکە هەمووی شەکەنێربێ.

**شەگێن:** شەکێن.

**شەل** (باک.): جوورە دروومانێکە. کوولەک، قلۆپ، لەنگ، گێڕ، پێلەنگ، شل، (ڕۆژ.) پالەنگ، مقرۆ. (باک.) قەد، ــ کردن: قەدکردن. ڕانک. مافوورە و بەرەی چرچ و خووار. تاخەرار. پارچە زەوییەکە لەپاڵ جۆگە ئاوێکیدا، کە هەمیشە بەهۆی ئاو دەلاندنیەوە سەوزبێ و غەداربێ.

**شەڵ** (هەورا.): شەل.

**شەلاخ:** زللە. (ئەردە.) شەلاق. قامچی.

**شەلاخکاری:** لە یەکێکدان بە شەلاخ، قامچی کاری.

**شەلاف:** ساختەچی، فێڵباز.

**شەلاق:** شولاق، شەلاخ، قەمچی. هەڵمەت.

**شەلاقە:** پەلوە، نەسرپال (سلوی). باڵندەیەکی ئاوییە بەقەد کۆترێکی دەبێ لاق و دندووکی درێژە و شین و بەڵەکە، (هەو.) شێلاقە، زۆرتر لە بەهاراندا دەبینرێ.

**شەلاڵ:** ماندوو، شەکەت. لە خووێندا ــ بوون: لە خووێندا خنکان، لە خووێن هەڵکێشران.

**شەلاڵە:** دروومانێکە ڕێک و پێک نەبێ گرژی و لۆچی لێ پەیدا ببێ، شلاڵە. پۆت، پۆتە، کۆکی دروومان.

**شەلان** (ئەردە.): شەل، لەنگ، لەنگان.

**شەلاندن:** ڕووتکردن بۆ دار و مرۆ و گیان لەبەران، بۆ مرۆیان تەنها جەردە دەیکا.

**شەلاندن** (موک.): لەنگاندن.

**شەلانشەلان** (ئەردە.): لاروالاروا، لەنگان لەنگان.

**شەلای** (هەورا.): شەلین.

**شەلایی** (ئەردە.): جوورە سەروپێچێکە ژنان لەسەری خۆیانی دەبەستن وەک هەوری وایە.

**شەلە:** لەنگە. ئاوشکینە، حەوتەمین ئەستێرەی حەوتەوانانەی گەورەیە، کە دەکەوێتە لای خووارووەوە.

**شەلەپە** (باک.): شلێوە. (باک.) شەلەپەلە.

**شەلەپەلە** (باک.): شلێوە.

**شەلەشەل:** کوولی کوولی، ڕۆیشتن بەلەنگەلەنگ، گێڕەگێڕ.

**شەلەقان** (کە.): گەمەیەکە بە هەنگڵەشەلە یەکێکیان ڕەپێی هاوەڵەکانی دەنێ بەومەرجە دەبێ قامکە گەورەی قاچە بڵندکراوەکەی بگرێ.

**شەلەگا:** شەلەگە.

**شەلەگە** (خۆ.، کۆ.، هەو.): کلکە، شەلەگا. دەراو، دەرگای جۆگەی دێراوانە، لە نێو جۆگەدا کەلێنێکی تایبەتی بۆ ئاو شکاندن دەهێڵنەوە، کەلەبەرێکە لە جۆگەی مەرمزەدا، کەساڵێک لەوەپێش ئاوی لێکرابێتە

سەر قاڵبەکە و ئیمساڵ گیرابێ بۆ ئەوەی ئەو قاڵبەیە بە بەیاری بمێنێتەوە و لە خوارترەوەی کەلەبەرێکی تر کرابێتەوە بۆ سەر قاڵبێکی تازە. ـــ دان: ڕێدان، مەیداندان. گۆڵێکیشە پەنگاوی خواردبێتەوە و دەراوی لێ بکرێتەوە بۆ ئاودانی شیناوەردی. سوولی، سوولاف، پرژ.

**شەڵەم** (هەورا.): شێلم، شەڵغەم.

**شەڵەمو** (ئەردە.): سڵقاو.

**شەڵەمە:** زیوان و پیسی ناودەغڵ. (هەورا.) ئاڵەکۆکە ڕیخنە، شەڵوار بە کۆڵ. گیایەکە. (ئەردە.) گیایەکی ڕەوانە بنەکەی وەک سێوی بن ئەرز وایە و بەهارییە.

**شەڵەم شێوێن:** دارێکی سەرپانە شێلمی لە مەنجەڵێدا پێ ئەودیو و ئەم دیو دەکرێ.

**شەڵەمێ** (هەورا.): شێلم.

**شەڵەمێنە:** (هەورا.) شەڵەمین. ترخێنە، تەرخێنە.

**شەڵەمین:** چێشتی چەنسوتەکە، ترخێنە.

**شەڵەمینکەرە:** بابردەڵە، تۆپێکە لە مووی گیایی ووشک. جوورە گوڵێکی زۆر جوانە. لە جوورە دڕوێکی سپی جووێ دەبێتەوە و با ڕای دەفرێنێ وەکوو گویزێکی وایە بەڵان سووک و تووکنە بە کەمترین هەوایەک وە حەوا دەکەوێ.

**شەڵەنگۆ** (باک.): گیایەکە.

**شەڵەوشەپک:** شەل و شەپک. ڕانک و چۆغە.

**شەڵبتاندن** (باک.): تووشی تەراخوەمە هاتن، چاڤێ شەڵبتی ژ چاڤێ کۆر چێترە.

**شەڵپ** (باک.): زللە، بەدبەخت.

**شەڵپاندن** (باک.): (بشەڵپینە) لابردن. لەڕیشەوە هەڵکەندن، دوورخستنەوە.

**شەڵپە** (باک.): چەکمە.

**شەڵپین** (باک.): لە ڕیشەهەڵکەنران، لاچوون، دوورکەوتنەوە.

**شەڵت** (باک.): ڕایێخی نووێنێ. شەڵتە.

**شەڵتاخ:** گێچەڵ، تەشقەڵە، دەبیە. چاچووڵە.

**شەڵتاق** (باک.): شڵتاخ، فێڵباز، ساختەچی.

**شەڵتان:** شەڵتە.

**شەڵتە:** ڕایێخ. (باک.) توورەکە جاوێکە، خوری و لۆکەی لەناو دەنێن دەیکەنە دۆشەگ، یا سەنیر. دەفرێکە دوولایی شاش تەنراوە وەکوو ڕەشکەی کاکێشان دەخرێتە سەرپشتی ووڵاخ بۆ کێشەی کاوکڵۆش و گزرە. نیوە غەکێکی گەورە یا بروێشی کولاوە یا چرێشێکی گەرم، کە بخرێتە سەرپەڕ و لەشووێنێکی بە ئازار لە برینان دەنرێ. پووڕە هەنگ. جوورە دەرپێیەکی ژنانەیە لە ژێر دەرپێوە لەپێ دەکرێ. تەلیس یا جەواڵێکە وەکوو تێری گل و زبڵ و چتی پێ دەکێشن و دوولاییە. سەرمای پاییز، زوقمی پاییز، ـــ لێی داوە، یا شەڵتە بردوویەتی، سری، ساردی.

**شەڵخە:** شەرخە، پووڕە، شەمرخە. دەستەوتیپی بێچووی مێش هەنگووینانە، شەڵغە، پووڕە هەنگ، شلپە.

**شەڵشی** (باک.): بەدبەختی، چارەڕەشی.

**شەڵغە:** شەڵخە.

**شەڵغەم:** شێلم.

**شەڵفە** (شا.): شفرەی بەرازییە.

**شەڵق** (باک.): جوورە ماسییەکە.

**شەڵکە:** (بابا.، کە.) تعبەقی ئاژاڵانە و ڕەشەووڵاخانە لە دوو سمان دەدات شەلی دەکات.

**شەڵکە:** ئاوەشکێنە. (جا.) فەرەنگی ووڵاخانە چوارپەلی ڕەق دەکاو تا دەمرێ لە خواردن ناکەوێ دەردێکی بێ دەرمان و بێ ئامانە.

**شەڵکەی ئاژاڵ و ووڵاخان:** سم بۆگەن دەبێ و شەلی دەکا.

**شەڵگە:** شەڵە، ئاوەشکێنە، کەلەبەرێکە لە جۆگەدا بکرێتەوە، کە ئاوی لێوە لابدرێ بۆ سەر کشتوکاڵ و باغ و بێستان.

**شەڵم:** شێلم.

**شەڵماو** (ئەردە.): شێلماو، شەلماب.

**شەڵە** (زا.): زیوانی ناو دەغل.

**شەڵەم کووێرم:** لێدان بەبێ تاوان بەبێ ئەوەی بزانی لە کێ دەدرێت. گەمەیەکی منداڵانە.

**شەڵوار:** (مەوک.) دەرپێی ژنان، شەڵوواڵ. (ڕەوا.، هەر.، کە.، هەو.، دەر.) پانتۆڵ.

**شەڵواربەکۆڵ:** ئاڵەکۆکە ڕیخنە، شەلواربەکۆڵ. (هەورا.) شەڵەمە. گیایەکە وەتۆڵکەی دەچێ بۆ لابردنی گرفت دەرمانێکی زۆر باشە. بنی سەڵکە وەکوو گێزەرییە هەرکەسێ لێی بخوا ڕەوانی دەکا و کرمیش دەکوژێ.

**شەڵوواڵ** (کە.): پانتۆڵ.

**شەڵ و پەت:** چتی لەت و پەت، لەت و کوت.

**شەڵ و شەپک:** ڕانک و چۆغە.

**شەڵ و شێت:** مرۆڤی شەلەپەتە و شێتۆکە.

**شەڵووف:** بیژوو، زۆڵ، بیژی. کەڵەشێری گچکە.

**شەڵوکوت:** کەشەنگ، ماندوو. بە ـــ ی ڕۆیشتن، بە ماندوێتی و شەکەتی ڕۆیشتن. پێیەوە ـــ بوون: پێیەوە زۆر ماندوو و شەکەتبوون.

**شەڵ و کووێر:** شەل وکوێر، هەژار و کلۆڵ.

**شەڵ ومار** (ئەردە.): لە، لەنگ.

**شەڵی:** گێری.

**شەڵیان** (باک.): ڕووتبوون.

**شەڵیاندن** (باک.): ڕووتکردن.

**شەڵیک** (باد.): پەڕۆیەکە بەسەردەمی گادۆشیدا دەدرێ تا چتی تری تێنەکەوێ.

**شەڵیل** (ئەردە.) جوورە خۆخێکە تووکی پێوەنییە.

**شەڵین:** نەجمین، بە لەنگی ڕۆیشتن، لەنگین، کوولین.

**شەم:** مێو، (هەورا.، هەو.) مۆم، فند، قرجەنە. (باک.) شەمە، شەممە. (ئەردە.) جێی سێبەر.

**شەما** (باد.): مێوی هەنگووین و نیتر.

**شەمماتە** (باک.): تەقە، دەنگ. کاتژمێری زەنگییە.

**شەمار** (هەکا.): هەزارپێ، خشک.

**شەمسی**: ماسییەکی قەڵەوی خڕنە هەردووک لا شانی وەکوو دەنگی شانەی ڕێزەشەی پێوەیە.

**شەماق**: زللە، سیلە، شەقەزللە.

**شەمال** (باد.): مۆم، مێو. (باک.) ڕووناکی.

شەمال

**شەماڵ**: بایەکە لەلای باشوورەوە دێ، (زەن.) وەشت.

**شەماڵە**: ئافرەتێک لەسەر یا لەنزیک سێ ڕیانێک شەموولەی دەگرێتەوە لە شەوی شەمووانداا دیارە نیازێکیش لە دڵدەگرێ جا ئەگەر ڕێبوارێک بەوێدا تێپەڕی و قسەیێکی خۆشی کرد دەیکا بەنوقلانەی پێکهاتنی نیازەکەی، خۆ کە قسەی ناخۆشی کرد ئەویش دەکا بە نوقلانەی پێک نەهاتنی مرازەکەی.

**شەماڵها**: وولاّخی خۆش ڕەوت.

**شەمالک** (باد.): مۆم، مێو.

**شەماڵێ**: شەماڵە. (هەورا.) شەمۆلە.

**شەمام**: شەمامە.

**شەمامە**: جوورە کاڵەکێکی زەرد و ڕەنگا و ڕەنگ و پڕ بە چەنگییە بۆنخۆش و دێغدێغە. (باک.) شەمامۆک.

**شەمامۆک**: شەمامۆکە.

**شەمامۆکە**: شەمامە.

**شەمامێنە** (ڕەوا.): بەنێکە کاڵە و زەردگاڵی پێ قایم دەکرێ. بەنکاڵە.

**شەمامێند** (خۆ.): بەنێکە کاڵەی پێ لە لاقی دەبەسترێ.

**شەمە**: نێوی ڕۆژێکە لە نێوانی هەینی و یەکشەمەدا، شەمۆ، شەم، شەنبە.

**شەمەبازاڕ** (ئەردە.): شوێنێکی تایبەتییە لە هەندێ جێگە لە هەموو ڕۆژێکی شەمۆیاندا چتی تێدا دەفرۆشن، لە شوێنەکانی تردا بەپێ بار و دەستووری خۆیان هەینی یا یەکێک لە ڕۆژەکانی تر دەکەنە ڕۆژی تایبەتی و لە شوێنێکیدا بازاڕێکی بەناوی ڕۆژی دانراو دەکەنەوە.

**شەمەت**: ناوی جاوێکی کرمانجییە.

**شەمەتریکە**: شەمەترێنکە.

**شەمەترێنکە**: شەمەتریلە. ڕیوەڵۆک، جوورە مێشێکی شینکاڵە نێو قەدی زۆر باریکە هەنگووینێکی دەکات زۆر لە ئی هەنگی خۆشترە و سووکترە و ئێجگار سپی و بۆنخۆشە.

**شەمەتلێنکە**: هەنگووینێکی جیری خۆشی شانە چکۆڵەیە و ڕەشبارە. مێشهەنگەکەش ڕەش و درێژ و ووریا و چالاکە.

**شەمەد**: پۆپەشمین، پارچەیەکی ناسک و تەنکە هاوینان بەخۆدا دەدرێ لەکاتی نوستنێدا.

**شەمەلەکۆرە**: شەمشەمەکۆرە.

**شەمەنەفەر** (فە.): ڕێگای ئاسن، ئەوی بەسەریدا دەڕوات قەتارە. خشۆک، شەمەنەفەر ووشەیەکی فەرەنسییە بەلاّن قەتار کوردییە کاروانچییان وولاّخیان تێدەخست قەریان پێدەگوت.

**شەمەنیخە**: چنگدانەچنگی یەکتری.

**شەمبە** (باک.): شەمە، شەمبی، شەمە.

**شەمبەلیلک** (باک.): گیایەکە، شەمبەلێک.

**شەمبڕ** (ئەردە.): دووارد، جاوبڕ، مقەس.

**شەمبلیلک** (زا.): قومام.

**شەمبلێک**:

**شەمبووز**: وولاّخی چەمووش.

**شەمبی** (باد.): جوورە توویەکی دەنک سپی و درێژکۆلەی کەم ناووکە. (باد.) شەمە.

**شەمتاندن** (باک.): هەڵخلیسکاندن، لە ڕێ دەرچوواندن.

**شەمتین** (باک.): هەڵخلیسکان، لە ڕێ دەرچوون.

**شەمچە**: (باک.) پێتک، گرتەک. فند، فندک، لێخرێنەوە، نەفتک، نفتک، گورت، شقارتە.

**شەمچک** (باک.): فێڵباز، ساختەچی.

**شەمدان**: مۆمدان، مێودان، فندانک، بێسووس، شەمسۆز.

**شەمدانی** (ئەردە.): گوڵێکە گەلاّی پان و ڕەنگا و ڕەنگە.

**شەمدین**: کورتکراوەی شەمسەدینی عارەبییە پاشی بوو بە شەمۆ، کە ناوی میری شەمدینانە.

**شەمدینان**: خاکێکە، کە شەمدینی تێدا ڕۆنیشتوون.

**شەمراندن**: براندنەوە (بشەمرینە). بەجێ هێشتن، پشت تێکردن.

**شەمرەخ**: گوندێکی گەورەیە لەناو دوومەلا چیای مازوو پایتەختی دەرەبەگی میرێکی دونبلایە تائیرۆژی مانە.

**شەمرەشکردن**: ڕەشکردنی مێو لەبەر تازیە.

**شەمرین** (باک.): برانەوە.

**شەمزان**: شەمزین.

**شەمزاو**: چتێکە شەمزی بێ.

**شەمزە**: کار و بەرخی بچووکن.

**شەمزێ**: ناوی گوندێکییە لەناو خەزرایە هێندێک پێی دەڵێن شەمسێ.

**شەمزین**: تێکچوونی چەرم بەهۆی زۆر هەتاو لێدانەوە.

**شەمزینان**: شەمدینان. *

**شەمزیو**: شەمزاو.

**شەمسان**: شەمزان.

**شەمساو**: شەمزاو.

**شەمسە**: قفڵ و دوگمەی لباد و پاڵتۆیە، کە لەسەر شێوەی گوڵی دروست دەکەن.

**شەمسۆز** (ئەردە.): شەمدان.

**شەمسین**: شەمزین.

**شەمسیو**: شەمزیو.

**شەمشاق**: (باک.) کەسێکە لە ئەندازە بەدەر جوامێری و پیاوەتی بکات.

**شەمشاڵ**: شمشاڵ. *

**شەمشە** (ئەردە.): چەکچەکیلە.

**شەمشەلە** (ئەردە.): شەمشەمەکوێرە.

**شەمشەلەکۆرە** (هەورا.): چەکچەکیلە.

**شەمشەلەکووێرە** (ئەردە.): چەکچەکیلە.

**شەمشەمە:** چەکچەکیلە، شەمشەمەکوێرە.

**شەمشەمەکۆرە:** چەکچەکیلە.*

**شەمشەمەکوێرە:** (زەن.) مێژونک، چەکچەکیلە، باڵندەیەکە زگ و زادەکا و لاقی بە باڵەکانیەوەیەتی.

**شەمشەمۆتک** (باک.): جێگای خلیسکێ.

**شەمشوولە:** تیرەیەکە لە هۆزی کەبابی، کە لەقەراخ هەولێرێ دادەنیشن.

**شەمع** (ع.): مۆم، مێو، بەرەمێو، مێوی هەنگوینی.

**شەموک:** کۆڵەکە، ئەستوندە.

**شەمعدان:** مۆمدان، مێودان.

**شەمکا:** ئێلێکی کوردە لەناو (هەڤیرکا) ندایە.

شەمکۆر

**شەمکۆر** (زەن.): کارمامز.

**شەمل** (باک.): چەفیەکە لەسەری دەبەسترێ. (زاخ.) بەرماڵ، دووگورد.

**شەملک** (باد.): بەرماڵ، دووگورد.

**شەمە:** رۆژێکە کەوتۆتە نێوانی هەینی و یەکشەممەوە، شەمۆ.

**شەممۆ:** شەممە، شەمە، شەممو.

**شەمۆ:** شەممە، شەمە.

**شەمۆتەدان** (کە.): کزبوون، توندبوون.

**شەمۆز:** یەکسمێکە بەدخوو و سەرکێش بێ، (جا.) چەمووش، (باک.) جوهم، زنجک. مرۆڤی توندوتیژ و تووڕەیە لەکاتی جنێودا بۆ مرۆڤانیش بەکاردەبرێ. ــ ی: چەمووشی.

**شەمۆس:** شەمۆز.

**شەمۆکا:** ئێلێکی کوردە لە نێو یەزیدیاندا.

**شەمۆلە:** (هەورا.) شەمالێ.

شەمو

**شەموو** (باد.): مەیموون.

**شەمووز:** شەمووس، چەمووش. وولاخێکە بۆ بارکردن و سووار بوون رانەوەستێ.

**شەمووس:** چەمووش.

**شەموولە** (بالە.): بووکە بە بارانە. (شەقلا.) داوەڵ. قوتیلەی نەفت.

**شەمێ** (کە.): شەم، مۆم و خڵتەی هەنگوینییە. مێوی خڵتەی هەنگوینییە.

**شەمێلە:** گیایەکی دەستچێنە و بۆنیشی خۆشە تۆوەکەی، کە وەکوو تۆوی بەزەرەکی زەرد و گەورەیە بە کولاّوی دەدرێ بە کەڵان.

**شەمی:** فندک. (باد.) شەمۆ.

**شەمیتۆک:** (باک.) جێگایەکە مرۆ لێ بخلیسکێ.

**شەمیتین:** هەڵشڵەپین.

**شەمیخین:** ترشانی چێشتە لەبەر گەرمایە.

**شەمیرائەنن:** دەستپەڵگرتن لە کارێک.

**شەن:** (کە.) رووخۆش، دەم بە پێکەنین. وورده تەلاش و پشکڵێکە بکرێتە ناو تەندوور لە کاتێکی، کە نزیکی ساردبوونەوەبێ. ملێب، ملهێبۆک، ملهێبوک، مەلهێب. (هەورا.) شەنەی کایە، شە. ــ کردن: بە باکردنی خەرمانی کوتراو بۆ سوورکردنی وورده تەلاشێک و پشکڵێکە لە کاتی ساردبوونەوەی تەندووریدا تێی دەکرێ و پێی گەرم دەکەن. یەکێکە لە مرازەکانی کەرەستەی جووتی. شەنە.

**شەنە:** دارێکی پێنج پەنجەیە خەرمانی گێرەکراوی پێ بەبا دەکرێ و خەرمانی پێ شەن دەکرێت. شەن. هەرچێکی وەکوو پشکەڵ و خاکەی تەپاڵە و ئیتر بە ئاووری داکەن تا تەووژمی خۆشتربێ.

**شەنەبا:** دەغڵ و دانی دووای کوترانی بە شەنەو بە باکردن بۆ سوورکردنی.

**شەنەباکردن:** دەغڵ و دان بەهۆی شەنەوە بەباکردن.

**شەنەکردن:** شەن و کەو کردن.

**شەنەی** (هەورا.): تەکاندنی دارەگوێز و ئیتر.

**شەنبۆ:** ناوی ئێلێکی کوردانە لە نێو هەکاریاندا مێژووی لێ دووراوە نەمرۆ لە شوێنی واندا (شەمدینا)ن خۆیایە. مێژوو بۆ خۆی: شەمۆ، بشەنبۆ دەگوێزێتەوە لەوانەیە لە بەشنەوی دەرکەوتبێ.

**شەندە لەمەندە کەمترنیە:** مەبەس لەوەیە، کە هەموو کەسێک لە ماف و بەشدا بەشدار و یەکسانە.

**شەنشە:** شوولی هەلاجی.

**شەنکردن:** بە باکردنی خەرمانی کوتراو بە شەن بۆ سوورکردنی.

**شەنگ:** شۆخ، جوان، چەلاک، دەلال، ناسک، چەلەنگ، شەنگۆڵ، شەنگە. رووالّ. قۆز، کەیفخۆش، عیشوەگەر، شاد. (شن.) هێز، تین. وورده کەل و پەلی ناوماڵ. فیشەک. (باک.) شنگ، ئەسپنگ، گیایەکە دەخورێ.

**شەنگال:** ژەنگار، شارێکی کوردی یەزیدییە لە رۆژاوای موسڵییە. چیای ژەنگاری لە گۆرانی و ئستراناندا زۆر باسکراوە.

**شەنگە:** نێوی پیاوانە.

**شەنگەبەرە** (بابا.): ژەنگەسوورە، شەنگەبەرەکەت.

**شەنگەبێ:** بڕوانە: شۆڕەبی.

**شەنگەسوورە:** ژەنگەسوورە.

**شەنگەڵەبەرەکەتە:** شمڵی بەرەکەتە مەبەس لە دوو دانە گوێز یا مازوو یا هەر چتێک لەبەری داران، کە پێکەوە نووسابن بەیەکەوە، شەنگوڵ.

**شەنگەبی:** شۆڕەبێ.

**شەنگەست** (باد.): پەیوەندی، بەندیواری.

**شەنگڵە:** شەنگڵە بەرەکەت.

**شەنگڵەبەرەکەت:** شەنگڵە، جمکە، دووانە. پیت و بەرەکەت. (خۆ.) شەنگوول، (خۆ.) خێرمانە. دوو گوێز یا دوو مازوو یا ئیتر، کە پێکەوە نووسابن: ــ یان پێدەڵێن.

**شەنگۆل:** شەنگڵە، شەنگ.

**شەنگووڵ:** شەنگڵەبەرەکەتە.

**شەنگێ:** شۆخێ، جوانێ، قۆزێ، چەلەنگێ.

**شەن و کەو:** لێدوران. هەر مەخلسیّ شەن و کەوە هەر مەخلسیّ کە کۆن.

**شەن وکەوکردن:** لێکدانەوە، لێکۆڵینەوە. حەشرکردن. لە شانەدان و بە کەوگیرداریێژتن.

**شەنهادۆ** (کف.): شاهێن، (باد.) شاقەسین.

**شەنی** (باک.): بێز و بۆلێکراو، لەسەر دڵان گران.

**شەو:** (باک.، باد.) شەڤ، شێڤ، شام.

**شەوات** (باک.): سووتان.

**شەوار:** (کە.، فە.) بە درێژایی شەویّ، شەوگار. شەوکردنە ڕۆژ لە ئاهەنگ و بەزمدا.

**شەوارە** (کە.): (ڕەوا.) شەوەرە، حەوتوو، نۆرەگرتن، ئاگالیّ بوونی حەوت ڕۆژەی ژنی زاوە لە منداڵەکەی. ڕاوی قاز و مراویانی ئاوتییە بە شەو مۆم یا بنە گۆزەڵەیەکی پڕناوور لە بنهەنگڵی دەگرن دەنێو ئاوێدا بۆ باڵندەکان دەچن ئەوانیش بە ڕووناکی ئاورەکەوە دێن کابراش دەیانگریّ و دەیاندا بە هاوڕێیەکانی پشتەوەی. کەسێکیشە یا گیان لەبەرێکیشە بە دیەمن چاوی هیچ کەموکورتی نیە کەچی ناشبینیّ. سەرلێشێواو، سەرگەردان، ئەو چێرگە شەوارەیە.

**شەوارەبوون:** سەرلیّ تێکچوونی گیاندار لە تاریکە شەوێدا بەهۆی دیتنی ڕووناکیەکی نزیک یا دوور و نەمانی و لەبەرچاو بزربوونی.

**شەوارەکەوتن:** شەوارەبوون.

**شەوارەکووێرە:** شەوارە.

**شەوازۆ:** بەشەو ئاژاڵ لەوەڕاندن و لە دەرەوە هێشتنەوەیان.

**شەواشینگ:** دارێکە بەرەکەی وەک چووالە وایە خۆشدەکریّ و دەخوریّ و پێی دەڵێن بایەف.

**شەواڵ** (فە.، لو.): دەرپیّ، پانتۆڵ، شەرواڵ.

**شەواڵسوورە:** شەرواڵ بەکۆڵ.

**شەواڵ مۆرد:** شەواڵ بەکۆڵ، شەرواڵ بەکۆڵ.

**شەرواڵ بەکۆڵ:** شەواڵەمۆرد، شەرواڵ بەکۆڵ.

**شەواڵبێن** (فە.): دۆخین، بەندەخووێن.

شەواڵبین: دۆخین.

**شەواڵشینک:** (سۆرا.) داری چەقالەیە، کاڵەشین.

**شەوان:** شەوانە، شەوگەل.

**شەوانە:** شەبەنگە، شەوگار.

**شەوانەدەر:** چەوەندەر.

**شەوبو:** ئاوی شەویّ، شەودێری. شینایی بەشەو ئاودان.

**شەوە:** مووروویەکی زۆر ڕەش و گرانبەهای کارەباییە ژنان دەیکەنە بەرموور یا گەردنبەند. (باد.) شەو، ڕەشی شەو. (ڕۆژ.) پەیران. شەورگ. دێوەزمەیەکە گۆیا بە کەڵکەڵە لە منداڵان دەدا، گۆیا بەو گرانباییە دەڵێن، کە بە قورسی لەکاتی نوستنێدا دەکەوێتە سەر لەشی گیان لەبەران. ئەو بیّ هۆشیەشە، کە تووشی منداڵ یا ئافرەتان دێت، کە لەشی منداڵ شین دەکات و دەمریّ.

**شەوەر:** شەوەڕ.

**شەوەڕ:** شەوەر، سێپەرە، (ئەردە.) شەوەرگ، گیایەکی دەستچێنە وەکوو وێنجە وایە سالیّ هەشت نۆ جاران دەدرووێتەوە دەدریّ بە وولاخان و لە وێنجە باشترە. هەندیّ کەسیش دەڵێن هەر وێنجەیە.

**شەوەرە** (ڕەوا.): نۆبە گرتنی منداڵی ساوا تا حەوت ڕۆژان بەشەو، حەوتوو، (کە.) شەوارە.

**شەوەڕەشە:** جێژنێکی بەناوبانگە لەنێو کاکەییاندا.

**شەوەرگ:** (ئەردە.) شەوەڕ.

**شەوەزەنگ:** تاریکەشەو، شەوی تاریک و تنووک، تاریکە شەوی ئەنگوستەچاو.

**شەوەزەن:** شەوەزەنگ.

**شەوەژەن:** کۆستەکی خەنجەر. دارێکە بەقەدەمەچەکیّ لە باسکی (گۆڵە) لە کونی دەرگاکە لە دیواردایە دەخریّ بۆ داخستن. سەربەن.

**شەوەسارە:** چێشتی شەویّ، چێشتێکە لە ئێوارێوە مابێتەوە بۆ بەیانی.

**شەوەق:** بەیانی کاتی سپێدە.

**شەوەکە:** شەبەکە، کونکون، کوناکونا، پەنجەرە. شەبەکەی پەنجەرە یا نووروسی. ئەویّ شەویّ.

**شەوەکی:** بەیانی، تاریک و ڕوونی بەیانی زوو. کردنی کارێک لە بەشی دوایی شەوێدا. لە شەوێدا، بەشەو.

**شەوەن** (ئەردە.): سەبارەت، هۆ، بۆنە.

**شەوەوەڕ:** (دزە.) جێگایەکە بەشەو خێڵات و کۆچەران شەوی لیّ ڕابووێرن.

**شەوبات** (ڕەوا.): چێشتێکە هی شەویّ مابێتەوە.

**شەوباز:** کەسێکە گەمەی میرمیرێن بگێڕی و هەڵی سووڕێنی.

**شەوباش:** شەگە، شەوخۆش.

**شەوبەرات:** شەوی بەراتیّ، شەوی (١٥) ی شەعبان.

**شەوبەک:** شۆبەکی هەویرییە.

**شەوبەکێو:** ماڵاتێکە بەشەو لە کێوی بمێنێتەوە.

**شەوبەن:** بەندی خەنجەر، کە دەرنەیەت. شەوبەند، شەوژەن.

**شەوبەند:** شوژەن.

**شەوبەندەڕۆژ:** کۆلکەزێڕینە. بەردێکیشە بە چەندین ڕەنگان بترووسکیّ.

**شەوبۆ:** شەهبوو، گوڵێکی بۆنخۆشی بەهارییە، زەرد و بنەوشە و سووری هەیە، گەڵای وەک هی بی وایە. بەشەو بۆندەدا. نێوی ئافرەتانیشە.

**شەوبۆی زەرد:** جوورە شەوبۆیەکی زەردە.

**شەوبووێر:** شەوبێر. ـــ ی: شەوبێری، شەو تا شەوێک.

**شەوبێدار:** شەونشین، شەڤناتۆروان، کەسێکە بەشەو نەنوویّ و بە ئاگابیّ، شەونەخوس. ـــ ی: شەونشینی، هەزارە، نەنوستن و ئاگادارییە لە شەوێدا.

**شەوبێر:** شەوبووێر. ـــ ی: شەوبووێری.

**شەوبات:** چێشتێکی شەوییە مابێتەوە.

**شەوت:** کەڵیژ، ئەنجام، تەزوو. ئازارێکە لە گوێی ڕەشەوولاخ و ئاژاڵاندا پەیدادەبیّ.

**شەوتا:** تایەکە شەوانە مرۆی دەگرێ.

**شەوتان** (باک.): سووتان، شەوطان.

**شەوتاندن** (باک.): سووتاندن، شەوطاندن.

**شەوتین** (باک.): سووتان، شەوطین.

**شەوچەرە:** داستانی تازە و چتێکی تازە روویدابێ و خەڵک باسی بکەن. ڕیسوا، بەدناو، کەسێکە لە شەونشینی و کاتی شەوچەلە خوواردنێدا بە خراپە لێی بدوێن و یا سەرزەنشتی بکەن. شەوچەلە.

**شەوچەلە:** جوورە میوەیەکی ووشک یا تەڕە، کە زستانان دووای نانی دەخورێ، (هەورا.) شەوچەرە، چرۆ، چەرەس، (هەورا.) شەوچەرەز.

**شەوچەلەز** (کە.، هەو.): شەوچەلە.

**شەوچرا:** (باک.) بسبسۆک، چۆڵەچرا، چراوک، چراوکە، چرایەکە بە شەو ڕاوی پێدەکرێ.

**شەوخەف:** کالایەکە هەر لەکاتی نوستنێدا لەبەردەکرێ. پێخەف. شەوکڵاو.

**شەوخەیبە:** (خۆ.) پەڕپووت، نابووت، بۆ مرۆ و ماڵاتان.

**شەوخوونی:** شەونخوونی.

**شەودۆس:** کەسێکە لە نێر یا مێ شەوانە بۆ بەدکرداری بخولێتەوە.

**شەودێر:** ئاودێری شینایییانە بە شەو. ــ ی: ئاو داشتنی شینایییان بە شەو. شەوارە.

**شەودێز:** چتی ڕەشباوە. ناوی ئەسپییە بە تایبەتی بە ئەسپی خوسرەوی پەرویز کوتراوە.

**شەور** (ئەردە.): پرس، ڕاوێژ.

**شەوڕەنگ:** بۆر، تەڵخ، بەدڕەنگ.

**شەوڕەو:** شەوڕۆ، کەسێکە بەشەو بڕوا. ــ ی: شەو ڕۆیی.

**شەوڕۆ:** کەسێکە بەشەو بگەڕێ و قۆناغان ببڕێ. ــ یی: ڕۆیشتن لە شەوێدا.

**شەوزوسان:** یەکەم شەوی زستانییە، کە لە هەمموو شەوێکی درێژترە.

**شەوژەن:** کۆستەکی خەنجەر. (هەورا.) گۆڵەی دەرکێیە، دارێکە بەقەد باسکێکی درێژە لە کونی دیواری دەرگا ڕادەکرێ و ئەوسا دادەخرێ، شەربەن.

**شەوسان** (ئەردە.): سەیزان، سەوداب. حەوشی مزگەوت یا خەوگەی شەوێ.

**شەوسکڵ:** پێ پەست کراو و ووردەکوت نەکراو لە خەرمان.

**شەوسۆ** (ئەردە.): سۆزی، سبەینێ.

**شەوسۆتەکە:** جۆرە مێشوولەیەکی بە ئالۆش و ووردە.

**شەوسۆتکە:** جوورە برینێکی بە سووێیە وەک بەفرەشینکە لە قامکی دەست و پێیان دێ.

**شەوسوو:** بەیانی زوو.

**شەوسووتەکە:** جوورە مێشوولەیەکی ووردی بە ئالۆشە.

**شەوشین** (زا.): ترنج.

**شەوق:** شۆق، رووناکی و بریقەی هێندێ چت، ڕۆشنایی. هەوەس، ئارەزوو، شادی، بەزم.

**شەوقاوێژ:** رووناکی دەر.

**شەوقدار:** خاوەند شەوق، ڕەوشەن، درەخشان. ــ ی: ڕەوشەنی.

**شەوقدانەوە:** پەیدابوونی شەوق لە چتێکەوە، درەوشانەوە.

**شەوقکردن:** شادی کردن، بەزم گرتن.

**شەوک** (باک.): قولاپی ماسی گرتنێ. (زا.) کرمەکی زێڕ.

**شەوکار:** کارێکە بەشەوبکرێ.

**شەوکەران:** بەفارسی شیکران. گیایەکی تفتە وەجەعفەری دەچێ لکەکانی وەچەتری دەچن گوڵەکانی سپین وەکو شوێت لاسکەکەی بۆگەن و پەڵەی سووری پێوەیە گەڵای سەوزێکی تاریکە بنەکەی وەچەوەندەری دەچێ ژەهراوییە کەسێ لێی بخوا دەمرێ، هی کێوانە.

**شەوکراس:** کراسێکە، کە تەنها بەشەو لەبەردەکرێ.

**شەوکڵاوە:** (دەر.) کڵاوقووچ. کڵاوێکی قیت و زۆر قووچ بوو لە موکریانێ و خاکی سۆراندا.

**شەوکۆر** (هەورا.، هەو.): شەوکوێر. ــ ی: شەوکوێری.

**شەوکۆک:** کەسێکە لەنیوەی شەوێدا لە شوێنێکی بەرزەوە خەڵکی بانگ بکاو ووشیاریان بکاتەوە.

**شەوکوور** (فە.): شەوکوێر. چەکچەکیلە. ــ ی: شەوکوێری.

**شەوکوورەک** (فە.): شەمشەمەکوێرە. چەکچەکیلە.

**شەوکوێر:** گیاندارێکە بەشەو چاوی نەبینێ، (هەو.) شەوکۆر، (فە.) شەوکوور. ئەگەر لەبەر هەژاری بێ: جەرگ و دڵی ئاژاڵێکی قەڵەو لەنێو دووگیدا سووریکرێتەوە سەریشی بەسەردابگری و تێریشی لێ بخووا چاکی دەکاتەوە. ــ ی: (هەورا.) شەوکۆری. چارەی ــ: داری کەفر پەڵکەکەی چەند دانەیەکی بکوترێ و لەگەڵ کەمێک ئاو بکوڵێنرێ چەند جارێکی هەر جارەی تنۆکێکی لە چاوی شەوکوێری بتکێنرێ زۆر بەکەڵکە.

**شەوکێل:** (باد.) شەکۆک، جوورە هەرمێیەکی گچکەیە.

**شەوگا** (ئەردە.): پەچەیەکە ئاژاڵان بەشەو تێدا بحەسێنەوە، هەسارگە، کۆتان.

**شەوگار:** بە درێژایی شەوێ، شەوار. ماوەی شەو لە ڕۆژاوا بوونەوە تا بەیانی. شەوانە.

**شەوگە:** شوێنێکە شەوانە مەڕ و ماڵاتی لێ ڕادەگیرێ.

**شەوگەڕ:** (بابا.) شەو، (شا.) شەوگەرد، (هەو.) پیسپیسۆک، جوورە داعبایەکە وەکوو مارمێلکەی بەقەلافەتە بەڵام ئەم پێوەدەدا. (مەک.) کێشکچی شەوێ.

**شەوگەرد** (فە.): پاسەوانی شەو، کێشکچی شەو. (شار.) شەوگورد، ڕێبەرە، (گەرد.، دزە.) داعبایەکە وەخەمەگرووی دەچێ گۆیا بەهەر زیندەوارێکیدا بمیزێ دایدەڕزێنێ و دەیتووڕێنێتەوە، (هەورا.، بابا.) داعبایەکە وەقەمقەمۆکەی دەچێ پنۆک پنۆکی ڕەش و سوور و سپی و زەردی هەیە وەمەخمەری دەچێ، دەنگی وەهەی سەمۆرەی دەچێ ژەهردارە و پێوەدەدات، گەلێک کەسی ووشیار و تێگەیشتوو و زانا جێگای باوەڕ دوو جوورە بیروباوەڕیان هەیە هەندێکیان دەڵێن هەیە هەندێکیشیان دەڵێن نەک نیە بەڵکوو هەر نەشبیستراوە. (فە.) پاسەوانی شەوێ.

**شەوگەردی:** شەوگەران.

**شەوگڕ** (ئەردە.): چراخان.

**شەوگورد**: شەرگەرد.

**شەوڵ**: زەوییێکی تەنگەبەرەیە بۆ کشتوکاڵ دەست بدات. (باک.) گڕی ئاوری.

**شەولەبان** (با.، موک.): بانگردێن، باگردان. داعبایەکی هەڵبەستراو و دارژتەیە منداڵی پێ دەترسێنن.

**شەولەوەڕ**: شەوئاژۆ، شەوین، شەوێن، لەوەڕێکیشە بەشەو بکرێتە بەر وولاخ و ئاژاڵان. شیوەخووار.

**شەولقاندن** (باک.): هەڵکردنی ئاوور، هاندان.

**شەولقی** (باد.): سیس و چرچ.

**شەولقین** (باک.): (بشەولقە). هەڵکران. هەندران.

**شەوێ گەرپاک**: شەولێکوم بوو. کەسێکە لێی شێوابێ و نەزانێ چەندی شەوێیە.

**شەومەنە**: شەومەندە. (هەورا.) چێشتی ماوەوەی شەوێ.

**شەومەندە**: شەوسار.

**شەومەهی** (فە.): مانگەشەو.

**شەونەخوس** (ئەردە.): شەوبێدار. ـــ ی: شەوبێداری.

**شەونەورۆز**: شەوی یەکەمی ساڵی تازەی کوردان.

**شەونخوون**: شەوبێدار.*

**شەونخوونی**: شەوبێداری، شەوخوونی، شەڤخووینی، شەونوخوونی. بەشەو لەپڕ را بەسەر دوژمن یا جێگایەکی دادان.

**شەونشین**: شەوبێدار، شەڤناتووران، کەسێکە بەشەو نەنووێ. ـــ ی: شەڤ بهۆرکێ، شەڤبێری، شەڤ بهێرک، شەوبێداری، هەزارە.

**شەونغوون**: شەویەڵغار، شەونخوون، چەپخون.

**شەونم**: ئاوونگ، خوناو، خوناووک، شەڤنەم، ئاڤینگ، تەرازیا، قەراو، شێ و نمی شەوییە، کە لەسەر شیناوەردی دەنیشێ لە بەهاراندا.

**شەونوێژ**: نوێژێکە لە بەشی دوایی شەوێدا بکرێ لە دوای نوستن و هەستانەوە. ـــ ی: کردنی نوێژێکییە دووای نیوەشەو ئەنجام بدرێ.

**شەونیا**: گەنج، پارە یا خشڵێکە بەشەو لەژێر خاکێدا بیشارنەوە یا نیشانەیەکە بەشەو بکرێت یا چتێک بە نیشان دابنرێت.

**شەووشەپک** (باک.): ڕانک و چۆغە.

**شەووگ** (ئەردە.): بەردی شەوە.

**شەووماکووک**: بورجی ئەستێران.

**شەوونیوەشەو**: جوورە گۆرانییێکی کوردییە.

**شەوهەنیانە**: (شەوجومعانە).

**شەوێ**: (هەورا.) شەوە.

**شەوێس** (کە.): پێخەف، نوێن.

**شەویەڵغار**: شەونخوون.

**شەوێ** (هەورا.): شەوە. کاتی شەو.

**شەوێن**: مۆڵدانی ئاژاڵان بەشەو لە چۆڵێ.

**شەوی**: کراس، هەرچتێکی شەوێ کەوتبێتە ڕۆژێ، ئەم چێشتە شەوییە.

**شەوی بین** (باک.): ووشک بوون و پێگەیشتنی گوڵی دانەوێڵە لەپێش کاتی خۆیدا.

**شەوی پەردە**: شەڤستان.

**شەوی تاریک**: (باک.) شەڤەڕەش.

**شەویتاندن** (باک.): سووتاندن.

**شەویلاک**: شەویلکە، شەویلە.

**شەویلە**: شەویلکە.

**شەویلکە**: ئێسکی چەنەگەیە، کە ددانی لەسەر دەڕوێ، شەویلە، کاچێر، (دزە.) کاژێر، ڕووشە، (باک.) ئاروو، (باک.) ئارگووشک، ئالیگووشک.

**شەوین**: (جا.): شەوئاژۆ. مەڕ بەشەو لەوەڕاندن، نۆبەت بەشەو گرتن. شەوێکی خۆشە لە بەهاراندا، کە باران باریبێ و خۆشی کردبێتەوە. شەو لەوەڕی ئاژاڵانە لە چۆڵ و چیایاندا.

**شەه**: شا، پادشا، میر، خونکار. کەی. شانە، شە. ـــ کرن: شانەکردن. تیف تیفە. ـــ کرن: تیف تیفە لێدان، پاک تاشین. (باک.) شەنە، شانە.

**شەهادەت** (ع.): ئاگایی، گەوایی.

**شەهادەتنامە**: گەوایی نامە، بڕوایی نامە.

**شەهاندن** (باک.): ناردن.

**شەهباز**: بازی پادشایان. شایان، شیاو، سەلیقەدار. ـــ ی: سەلیقە، شایانی.

**شەهبەلووت** (باک.): جووره خورمایەکی ڕەشە.

**شەهبەن** (باک.): قەیتان، بەن.

**شەهبوو** (باک.): شەوبۆ، گوڵێکە.

**شەهت**: بەراویتە.

**شەهتاندن** (باک.): بێ گوێیی کردن، گوێ نەدان، لاساری، فڕێدان. (بشەهتینە).

**شەهتۆت**: بەدەم، دەمەوەر. باڵندەیەکە. ـــ ی: بەدەم و پلی، دەمەوەری.

**شەهتی**: بەراویتەیی، بەراویژتەیی.

**شەهدانە**: شەدانە.

**شەهدەروان** (باک.): حەوزێکە ئاوی فڕێ بدات بۆ دەرەوە یا بۆ هەوا، ئافوورە.

**شەهر** (باک.): مێزەر و پێچی ڕیشوودار.

**شەهربوون**: هەستانە سەر پاشوونی وولاخانە.

**شەهرەزا** (باک.): بەڵەد، شارەزا. ـــ یی: شارەزایی، بەڵەدی.

**شەهرێ** (باک.): شارێ.

**شەهفەجووسک** (باک.): گیایەکە.

**شەهک** (باک.): شانەی چکۆڵە. ئەنباری تفەنگێ.

**شەهکرن**: شانەکردن.

**شەهلەوەند** (باک.): ئازا، هەرزەکار.

**شەهلوول** (باک.): شالوول، (باک.) شالوور.

**شەهمات**: کوشتنی شای شەترەنجە لە یاری کردنێدا، خانی دەفەرمووێ

فیل و روخ و کەرگەدەن کو هاتن
دین میر و معـلمی خوە مـاتن

**شەهمار** (باک.): هەزارپێ.

**شەهمەرشا** (باک.): شاهەنشا.

**شەهمێر** (باک.): شامێر، ئازا، پردڵ. کەڵەمێر. ـ ی: شامێری، ئازایی.

**شەهن:** شەم.

**شەهنامەشـەهیدا:** چامـەیێکی جیگەرخوێنییـە لـە بـەرگی یەکـەمی دیوانەکەیدا چاپکراوە.

**شەهندێر** (باک.): بازاڕی بە برەو و بەرمێن.

**شەهنڤان:** (باد.) شینایییەوان.

**شەهنشاه:** شاهەنشا، میری میران. ـ ی: شاهەنشاهی.

**شەهنشین:** شانشینی خانووان، میچێکە لەلای سەروویماڵی.

**شەهنشینی:** شانشین.*

**شەهوەت:** هەوەس، با، هۆک.

**شەهوو** (باک.): ڕچە.

**شەهێن:** شایەن، تـەرازوو. (بـاک.) شـەهین، شاهێن، دارێکی کێوی بێ هێز و کلۆرە وەکو داری قەرەقاچ وایە و لەپێش هەموو دارێکی سەوز دەبێ و دەگەشێتەوە لەنێو کێو و جەنگەڵاندا دەژی. باڵندەیەکی گەورەیە.

**شەهین:** حیلاندنی ئەسپی. بشەهە. (باک.) شەهێنی تەرازوو.

**شەهینۆک** (باک.): داری سەوز، درەخت.

**شەهیانە** (باک.): شاهانە.

**شەهید** (ع.): کەسێکە لە ڕێگای نیشتمان و گەل کوژرابێ.

**شەی:** (لو.) کراس.

**شەیبووک** (باک.): ئەمامی یەکسالانەیە.

**شەیپوور:** شێپوور، کەرەنا، پارچەیەکە لە کەرەستەی مۆزیقە.

**شەیپوورچی:** سیپورچی، کەسێکە سێپووری لێبدات.

**شەیپێ:** پەنجە و پشتی پێ.

**شەیتان:** هێزێکی خراپە لە ئادەمیزاددا بیری خراپی بە دڵ دادەهێنێ. دێـو، درنج، چەتوون. مرۆڤی خراو.

**شەیتان ئاووس:** گیسکی دوو بەهارە کە زگی پڕبێ. مێینـەیێ کـە وا بزانـێ ئاوسە و ئاوسیش نەبێ.*

**شەیتان پەرست:** شیدا یـەزەکی، شـەیتان پـەرس، داسنی. ـ ی : شـەیتان پەرسی، داسنێتی، ئـەو یەزیدیانـەن، کـە ڕێگای پێشـوویان لـێ گۆڕابـێ شەیتانیان لەداخی موسڵمانان خۆش بووێ.

**شەیتان پێ پێکەنین:** مـەبەس لـە خۆناسینی کچ و کوڕە لەتافی لاویدا.

**شەیتان لغاو:** قەمتەر.

**شـەیتانۆکە:** قاقلۆکەشـەیتان، قاقلەجنۆکـە، ـ ی نیوگڵی، قەپووچکـە، قەپووشکە، چتێکە لە کوژەکە کەرانە دەچێ و کرمیشی تێدایە.

**شەیتانی:** دووزمانی، ئاپەتەری، دەستبڕی. جوورە درووەمانێکە.

**شەیتانی بوون:** لـە خەودا جووت و ڕەحەت بوون، خۆناسین.

**شـەیدا:** سەوداسـەر، گـراو، واڵـە، واڵـەمـەن. کەسـێکە لـەبـەر زۆر خۆشەویستی چتێکا شێت بووبێ. دێو، پەرپەرشک، (باک.) ئاپتـەر. شەیدان، شێفتە، سەرگەردان. بەرمێرگ، مێرگ، شەیتان.

**شەیدانک** (باک.): کونجی.

**شەیدایی:** شێتی و سەرگەردانی بۆ چتێک.

**شەیدەست:** پشتی دەست.

**شبری** (باک.): کورتان.

**شپ** (ئەردە.): شۆڕ، درێژ.

**شپرزە:** چەواشـە، خـەوخی، شـەپرزە، شـەپرێو، سـەرلێ شـێواو، ڕەنـگ هەڵگەڕاو، نێوی نێرینانـە. ـ بوون: شپرێوبوون، شێوان، پەشۆکان، پەشێوان، تێکچـوون. ـ کـردن: ئـاژاوەکردن، شێواندن، پەشـۆکاندن، پەشـێواندن، تێکـدان، هـەڵبزڕکاندن، سـەرلێ شـێواندن. تێکـەڵ و پێکەڵکردن، ئاڵۆزکردن. ـ یی: پشێوی، تێکچوون، ئاژاوە، پەشـۆکاوی، (جـا.) ئـاژەڵ، (هـەورا.) ئاژاوڵـە. بـێ ئـارامی، سـەرلێ شـێواوی، هەڵبزڕکاوی.

**شپرزیاگ:** شپرزە.

**شپرێو:** شـەپرێو، شـەپرزە، ئائـارام، ئـاژاوە، پشـێو، شپرزە، پەشـۆکاو، شێواو، تێکدراو، پەشێواو. ـ بوون: شپرزەبوون. ـ کردن: شپرزەکردن.

**شپرێوی:** شپرزەیی، پەشۆکی، پەشۆکاوی، پەشێواوی، شێواوی.

**شەش:** (فە.) شش.

**سشەک:** (باک.) ماڵووی جووتی.

**شپڵ:** (هەو.) تەین و لەیان. نەخۆشیەکە.

**شپڵتە** (خۆ.): شاپلیتە. پەڕۆی نەفتاوی لوولدراوە، کە گڕی تێبەردرابێ.

**شپنە** (باک.): دەشت، زەوی ڕاست و پان و تەخت.

**شپ و شۆڕ:** شـل و شـۆڕ، شـل و شـۆڕ، واژەی گـورج و گۆڵـە. کەسـێکە شپرێوبێ.

**شت:** چت، تشت، چتمەک، چتومەک، کەل وپەل، چشت. (باک.) مادە، تەبا.

**شتاق** (خۆ.): چتاق، هیچ کامیان.

**شتەغالی** (باک.): بەرەکەبەرەک، ئاخافتن، ئاخۆتن.

**شتەغلین** (باک.): شتەغالین.

**شتەو:** شتۆ.

**شتەی** (هەورا.): سوشتن.

**شتران** (باد.): جوورە بەردێکی نەرمە.

**شترکینە** (ئەردە.): تۆڵەئەستێن، ووشترکینە، ووشترقین.

**شترگاوپلنگ:** ووشترگاوپڵنگ (زرافە). تاریک، دژ.

**شترمورغ:** ووشترمورغ.

**شتل** (باک.): شەتڵ.

**شتڵ:** شەتڵ.

**شتلاندن** (باک.): داری گچکە چەقاندن. بشتلیینە.

**شتلین:** چەقین، چەقانی داری گچکە.

**شتەک:** چتمەک.

**شتن:** شوشتن، شۆرین.

**شتنەوە:** پاک کردنەوەی دانەوێڵە بە ئاو. جنێو پێدان، دارا بارامی شتەوە، واتە زۆری جنێو پێدا.

**شتۆ** (باک.): جوورە ترێیەکە. ووتەیەکە سەگی پێ بەردەدرێ لە چت یا لە کەس یا لە سەگێکی تر.

**شتوشۆ:** شوستوشۆ، شۆرین.

**شتوو** (باد.): جوورە هەرمێیەکە تا زستانێ هەردەمێنێ.

**شتووک** (زا.): ئاوێکی زەردە، کە دەکەوێتە سەر دۆ و دەکوڵێنرێ و لە لەشی هەتاوبردوو دەدرێت.

**شتوومەک:** چتمەک، کەل و پەل.

**شتی** (باد.): شووتی.

**شتیار** (باک.): ئاشکرا، دیار. بێ خەم، بێ باک. ـــ ی: ئاشکرایی. بێ خەمی، بێ باکی.

**شتیر:** تەویلە.

**شتین:** چاوچنۆک، کەسێکە هەمیشە چاوی لە چتی ئەم و ئەو بێ و بەبێ چت هیچ کارێکی بۆ کەس نەکات.

**شخاتە:** شخارتە: لێخرینە، شەمچە، شخاتە، شقارتە، شەمزان، شەمسپی، گۆگرد.

**شخت** (باک.): خەت، جغز، جەغز، جخز.

**شخرە:** شەغرە.

**شخڵ** (هەورا.): خشڵ.

**شخوو** (باد.): خۆرایی.

**شڕ** (هەورا.): لیفە. (باک.) دەنگی ئاوییە. شڕشڕ: شۆڕەشۆڕ. دڕاو، پارچەپارچە، هەلاهەلا، وونجڕەوونجڕ، دڕپاک. شیڕ، بۆ فشە بە کەسێکی کردن بەکاردەبرێ، (ئەردە.) هڕ. ـــ لە دەست و نووسینت: شیڕ.

**شڕهیرک** (گۆ.): شڵێوە.

**شڕە:** شڕوشاڵات، پاتاڵ، پەڕۆی کۆن، بزگوڕ، شڕوشیتاڵ، پاشماک، سەرپەش، میرات، بزگوڕی مردووان. شڕ و ووڕ، شێواو، پاتاڵی دڕاو، جل و بەرگی دڕاو و کۆنە، دارزیاک.

**شڕەبار:** شڕاڵ.

**شڕەڤان** (باد.): شەرکەر.

**شڕەق** (ئەردە.): درز، ترەک.

**شڕەقە:** تەقە.

**شڕەقیان** (ئەردە.): درزبردن.

**شڕەکر:** پێما. خوێنکر، خوێنەخوا، خوێنەخوێ. میراتکر.

**شڕەکری:** پێمایی، خوێنکری.

**شڕەوبڕە:** ووردەواڵەی ماڵێ یاهی دووکانێ. (هەورا.) شڕوپڕ. شوورەوموورە. کەرت و پەرت، شڕوپڕە.

**شڕەوپڕە:** شڕوشیتاڵ، شڕەومڕە.

**شڕەوشیتاڵ:** شڕەوبڕە.

**شڕەومڕە:** شڕەوبڕە.

**شرب** (ئەردە.): دارێکی ناوداره، عەرعەری کێوی.

**شڕبوون:** دڕان.

**شڕپ** (باک.): (باک.) ئیشارپ. هەوری و پۆشییە ژن لە سەری خۆیانی دەبەستن.

**شڕپژن** (کە.): ترپژن.

**شڕپۆش:** کەسێکە پۆشاکەکەی دڕاو و ڕیندۆڵ ڕیندۆڵ بێ. ـــ ی: پۆشاکی دڕاو و شڕ و ووڕ لەبەرکردن. قەلەندەری، پشت لە خۆشی جیهانکردن.

**شرت** (باک.): بادامی تاڵ. بڕوانە: شرتک.

**شرتک** (باد.): توولەی مێو. لکەداری وورده دەیکەنە گسک.

**شرت و شۆڵ بڕین:** مەبەس لە جنێودانێکی زۆرە بە یەکێکی.

**شرخە:** شەرخە.

**شردن** (باک.): هەوێن، قاوورمە.

**شڕش:** (باک.) بەشە لۆکەیەکی کراوەوە و پەرەکراوە.

**شڕشڕ:** دەنگی چۆڕاوگە.

**شرقە:** قرمە.

**شرقەشرق:** قرچەقرچی شکانی دارانە.

**شرقەوباڵی** (هەورا.): شەقەقەی باڵی.

**شڕک** (باک.): داو، تەپکەی باڵندانە. (باک.) پلووسک، سوولاوک. شڵپەی ئاوێ. (باک.) شیرەی سەماوەرێ و ئیتر. (باک.) گوڵنک، گوڵینک.

**شڕکردن:** دڕاندن، پارچەپارچەکردن. گاڵەپێکردن، حەشرپێکردن، جنێوپێدان.

**شرم شرم:** ووتەی بێ سەروپێ.

**شرن** (باک.): لمووزی بەرازی، لمۆز، کەلبەی بەرازی.

**شرنە** (باک.): لمووزی بەرازی.

**شرنگ:** شرنگە.

**شرنگە:** جوورە دەنگێکە وەکو دەنگی شیر و خەنجەر، کە بوەشێنرێ.

**شرنگین** (باک.): دەنگی زەنگۆڵەیە، خشەخش، زەنگ و هۆڕ. ـــ ی: دەنگی زەنگ و هۆڕ.

**شڕۆڵ:** تیتۆل، کەسێکە جلکی شڕبێ، ڕیتاڵ.

**شرواڵ** (فە.): پانتۆڵ.

**شرووەهەڵاڵێ:** (هەورا.) گوڵێکی سوور و سپییە وەکو هەڵاڵەبراییە وایە بەڵام کچکە ترە.

**شڕوبڕ:** شڕوپڕ.

**شڕوپڕ:** پرزۆڵە، زیواڵ، پارچەی شڕ، شڕوشیواڵ.

**شڕودڕ:** شەرفرۆش، شەڕانی، جەنگاوەر، زمان پیس، بێ شەرم.

**شڕوشاڵات:** بزگوڕ، شڕە، شرت و پرت، پاتاڵ.

**شڕوشڕۆڵ:** شڕ و ووڕ، قەڵتەبان. (باد.) شلیخە.

**شڕوشۆڵ:** ڕەش و ڕووت، نابووت.

**شڕوشیتاڵ:** کەل و پەلی کۆن و دڕاو، شڕاڵ.

**شڕوشیواڵ:** کەل و پەلی کۆن و دڕاو.

**شروو** (خۆ.): پەرۆش، خەفەت.

**شرووڤە** (باک.): ڕاڤەکرن.

**شڕ و ووڕ:** شڕوشڕۆڵ، شڕ، دڕاو، وونجڕ بە وونجڕ، وونجڕ، وونجڕ وونجڕ، داڕزاو، هەڵیت، هەڵیت و پەڵیت.

**شڕها:** بۆ گەمە و فشە بە کەسێک کرن بەکاردەبرێ وەکو: شیڕها، جمباو.

**شرێ** (باک.): نەخۆش، بیمار.

**شرێز** (باک.): چرێش.

**شریاز** (باک.): گیایەکە.

**شریت** (باک.): کەندری باریک و ئەستوور، کە لە دەزوو دروستکرابێ.

**شریخاندن:** شریخەکردنی هەور، قیژاندنی یەکێک زۆر بە توندی، چریکاندن، زریکاندن، شیتانن.

**شریخانن:** شریخاندن.

**شریخە:** چریکە، شیتە، زریکە، دەنگێکە وەک هەورە برووسکە، شریخەشریخ، شریخ و هۆڕ، شریخەی یەک لەدووای یەکتری، دەنگی برووسکە و هەورییە.

**شریخەشریخ:** شریخەی یەک لە دووای یەکتری، شریخ و هۆڕ.

**شریس** (فە.): چرێش.

**شریق** (باک.): دەنگی لێدانێیە بە قامچی و چتی تر.

**شریقە:** شیرقە، شریخە، دەنگی هەور.

**شریقەشریقە:** دەنگە دەنگی تفەنگان.

**شریقەشریقەکردن:** شریکاندن.

شرینقە

**شرینقە:** جوورە دەرزییەکی دیار و ناسراوە دەرمانی شلی تێدەکرێ لە لەشی گیان لەبەران دەدرێت.

**شزڤی:** ناوی کێوێکییە لەلای هەڵەبجە لەنزیک دێی عەبابەیلەیە.

**شز** (باک.): کیمێکە تێکەڵاوی خوێن بێ، زۆخ، زووخاو.

**شزک** (باک.): وورده بەرد.

**شزی** (باک.): کێم و خوێن.

**شست** (باک.): سست.

**شستوشۆ:** شوست و شۆ. ــ دان: شوشتن.

**شش** (هەورا.): شەش. (ڕۆژ.) سیپەلاک. (فە.) ئەسپێ.

**ششم** (هەورا.): شەشەم.

**ششت:** چت.

**ششتن:** شوشتن.

**ششتنەوە:** شوشتنەوە، شتنەوە.

**شعفی** (باد.): جوورە ترێیەکە زوو پێدەگا.

**شخب** (زا.): مەتەی دارتاش.

**شخارتە:** شقارتە، شەمچە، لێخرێنە.

**شخت** (باک.): دیغ، خەت. ــ کردن: خەت و دیغ کردن.

**شفتالیم** (باک.): کارتە، کەو. لکی چکۆڵەی داران.

**شفتە** (گەرمێن): گۆشتی قیمە بە ئاردەوە پارچەپارچەی پان و خڕ و گچکە لە نێو ڕۆنیدا سوور دەکرێتەوە، شامی کەباب. (ئەردە.) قسلاوی خست. کفتەی خڕ و پانکۆڵەی گۆشتی قیمەیە، کە لەناو ڕۆنیدا سوورکرابێتەوە.

**شفتەزێ:** (هەو.، جا.) ژنێکە هێشتا منداڵی لە شیری نەکردبێتەوە و ئاووس بێ و بزێ و شیری کۆن و تازە یەکتری بگرێتەوە. بڕوانە: شفتەژێ.

**شفتەژە:** شفتەژێ.

**شفتەژێ** (هەورا.): ژنێکە هەموو ساڵێکی بزێ و زۆر زگان بکات، کە هێشتا منداڵی لە شیر نەکردبێتەوە.

**شفتیل:** شووڵی تەڕ و باریک، کە لە چت بپێچرێ.

**شفتی** (باد.، هەو.): شووتی.

**شفرە:** دوو ددانە درێژ و تیژەکانی بەرازی یەکانەیە یا فیلی لەولاولای زارێتی، بڕە، شەلفە، مەرقوول، شارووان، گیرە. جوورە کەتیرە و جیوەیەکە.

**شفرەی فیل:** دوو ددانە درێژەکانی فیلی.

**شفشینک** (باد.): چەقالە.

**شف** (باک.): نەواڵ، شووێنی نزم و نەوی، داردەست.

**شفارێ** (باد.): پیادەڕێ.

**شفان** (باک.): شووان.

**شفانشتەغلیک** (باک.): شووان هەڵخەڵەتێنە.

**شفانشتەغلینەک** (باک.): شووان هەڵخەڵەتێنە.

**شفانی** (باک.): شووانی.

**شفانێتی** (باک.): شووانیێتی.

**شفتانی** (باک.): داردەست.

**شفر** (باک.): شوور، گاکێوی.

**شفژی** (بۆت.): سەرکۆزەری دەغڵی.

**شفقەلوون** (باک.): لوولەی بەرمیلی.

**شفک** (باک.): کەو، کارتە. لکی چکۆڵەی داران، شووڵ.

**شفن** (باک.): گاکێوی. بزنەکێوی.

**شفنە** (باک.): ماڵووی جووتی.

**شفەهشینک** (باک.): دارەچەقالە.

**شفیلە** (باک.): باریکەڕێ، ڕچە.

**شق** (ئامێ.): ماندوو. شقێتە: ماندوونەبی.

**شقارتە:** شخارتە، لێخرێنە، شەمچە.

**شقاقی:** شوقاقی، جوورە دەردێکە تووشی چوارپەلی چارەوێیان دێ و لە سوواری و کاری دەخات.

**شقام** (باد.): شەقەزللە.

**شقێتە** (ئامێ.): ماندوونەبی.

**شک:** گومان.

**شکاتێیەنەکریا** (هەورا.): پاڕاوە، دادخوازراو.

**شکار** (هەورا.): ڕاو، نەچیر. مرازێکە بە دووای هەر ناوێکەوە بنووسێ دەیکاتە بکەر: دڵشکار، شێرشکار. (باک.) کەڵەکی ووردەبەردان، کۆمای ووردەبەردان. (باک.) چەقێن، زەوی بەردەڵان.

**شکارتە**: پارچە دەغڵێکی کەمە چێنرابێ بۆ یارمەتی کەسێکی تر.

**شکارتەکێڵ**: جووتبەندەیێکی دەستکورتە. پارچە زەوییەکە، کە بۆ شکارتە کێڵرابێ.

**شکارچی** (هەورا.): ڕاوکەر، ڕاوکار، نێچیرەوان.

**شکارگا**: ڕاوگە، شووێنی ڕاو.

**شکاروان**: شکارچی، ڕاوکار.

**شکاری**: ڕاوکردن.

**شکافە** (ئەردە.): مرازێکی گچکەیە، کە تاری پێ لێدەدەن.

**شکافت** (ئەردە.): درز، ترەک.

**شکافتن**: درزبردن، ترەکین، دڕان. درز پێبردن، ترەکاندن، دڕاندن.

**شکاک**: ناڤی ئێلێکی گەورەی کوردە لەنزیک ڕەزاییە (وورمێ)، ماڵە عەلی خانی جازی و ئیسماعیل خانی سمکۆ سەرۆکی ئەو ئێلەی بوون.

**شکاکی**: جوورە هەڵپەڕینێکە.

**شکالاندەک** (باد.): کەلووی پاقلە و ئیترە.

**شکان**: شکیان، دووپارچە و کەرت بوون، مەرپایی. ڕاشکان، شکەستن. (فە.) شکێن، تووتووخێن، دەرزین، پارچەبوونی چتی ڕەق. بەزین لە شەڕێدا، تەقە تێکەوتن، هەڵاتن، ڕەوین. ڕۆژوو ـــ: مەبەس لە خواردن و خواردنەوە لەکاتێکیدا، کە مرۆ بەڕۆژوو بێ. هاتنە خووارەوەی نرخی چتییە.

**شکانەوە**: بێ کەیف و خەفەتبار بوون.

**شکاندن**: پەیمان و بەڵێن شکاندن: مەبەس لە پەشیمانی و هەڵوەشاندنەوەی پەیمان و بەڵێنییە. (هەورا.) مەرپایۆ. قەرساندن، مخمخاندن، هڕاندن، شکێناندن، داشکاندن، ڕاشکاندن، دوو یا چەند پارچەکردن، ماردەی، هەرشاندن، هەرساندن، تووتووخاندن، دەرزاندن، پارچەپارچەکردنی چتی ڕەق. ـــ ی لەشکر: ڕاونان، شکست تێخستن. ڕاونان، بەزاندن، تەقەتێخستن، ڕەواندن. تی ـــ: . ڕۆژوو ـــ: نان و ئاو و خواردەمەنی خواردن لەکاتی ڕۆژووگرتنێدا. نرخ هێنانە خووار. تین ـــ: تووشی زیانکردن. کەسێکی بە جنێو و زماندرێژی شکاندنەوە.

**شکاندنەوە**: دووبارە پارچەکردن، قرچەشکێن کردن. بەزاندنەوە. شکاندنی لکی داروبار و گەڵا لێکردنەوەیان، گەڵا لێکردنەوەی توتن کاتێکی، کە زەرد دەبێ. منداڵ فێرەکارکردن، کە تۆزێ خۆی گرت. ـــ ی چا: ڕۆکردنی هێندێ لە چای تازە لێنراو و تێکردنەوەی بۆ سەرەوخواربوون و دەم کێشانی.

**شکانن**: شکاندن. شکاندنی قەند و گوێز و بادام و ئیتر. شەرم ـــ: ڕووکردنەوە. کەمکردن و هێنانە خووارەوەی نرخی کەل و پەلان. دەرگە ـــ: دەرکە کردنەوە.

**شکاننەوە**: شکاندنەوە. چتی توند وسفت شل کردنەوە، ڕاوەشاندن، تەکاندن، جووڵاندن.

**شکاو**: شکیاو، چەپرەک، چەپلەک، چتێکی ڕەقە، کە پارچەپارچە بووبێ، بۆ کەل و پەلێکیش دەبێ، کە نرخی هاتبێتە خووارەوە. مرۆڤێکە شکابێتەوە، ڕیسوابووبێ.

**شکاوی**: شکستی، شکیاوی. چت بە ـــ نافرۆشرێ، واتە لەکاتێکی، کە چتێک شکابێ نافرۆشرێ. نرخ هاتنە خووارەوەی چت یا کەسێکی.

**شکایەت** (ع.): داد، دادخووازی، دادکردن، دادوبێدادکردن، هانا، گلە، گازاندە، گلەیی.

**شکەبەر** (باد.): دیوارێکە لە ووشکەبەردان دروستکرابێ.

**شکەر** (باک.): کەڵەکی ووردەبەردان.

**شکەست**: شکست.

**شکەستەک** (باک.): شکستی.

**شکەستن**: شکاندن. شەڤ شکیان: نیوەی شەو ڕاشکا.

**شکەستی**: شکەستەک.

**شکەفت** (باد.): ئەشکەوت. (باک.) مەلاشوو.

**شکەفتا**: گوندێکە لەناو (ڕەما) ندایە.

**شکەفتا دەڤی من** (باک.): مەلاشووی من.

**شکەڤ**: چەلەنگ، بەرمیل، پیپ، شکەڤک. قاپی چێشت تێداخواردن.

**شکەڤک** (باک.): چەلەنگ. کاسە و ئامانی دارین، کە نان و ئاویان تێدا دەخورێ.

**شکەلک** (باد.): سووالەت، پارچە دیزە و گۆزەی شکاو.

**شکەلووک** (باد.): تێکوڵی چت.

**شکەم دوورپیدە**: لادانێکی گەورەیە لەنێو دیواری ژوورەوەدا شوشەبەند دەکرێ لە زستاندا تێیدا دەنوون.

**شکەن** (ئەردە.): چین، چرچ، لۆچ.

**شکەنجە**: ئەشکەنجە.

**شکەو**: (گەرد. باک.) کاسەی دارینە بۆ ماستاو و ئیتر.

**شکەوێک**: تەبەکی دار.

**شکس**: شکست، شکستی.

**شکەە**: شکست، شکیاگ.

**شکست**: شکستەک. دڵۆ، زەدە، کەم و کووڕی. چتی شکاو و درزبردوو.

**شکستە**: جوورە نووسینێکی تایبەتی تێهەڵکێشە. تاقێکە کەوانەکەی نزم دروست کرابێ. لەشکری شکاو، بەزیو، بەزیاگ، شکیاگ، هەڵهاتگ.

**شکستۆبەستەی** (هەورا.): شکاو هەڵبەستنەوە.

**شکستۆبینای** (هەورا.): شکاو هەڵبەستنەوە.

**شکست هۆربیلۆ**: شکست هەڵبستەوە.

**شکست هۆربەستە**: شکست هەڵبەستنەوە.

**شکست هۆرگێن** (هەورا.): شکست هەڵبەستنەوە.

**شکستی**: شکان. شووێنی درزبردوو.

**شکڵ**: ئەلاڤەت، توویزم، دیمەن، شێوە، دروشم. وێنە، نیگار.

**شکڵنووس**: کەسێکە لەبەر شکڵی نووسراوێک بنووسێتەوە بەبێ کەم و کووڕی.

**شکڵێ** (هەورا.): شکڵ، چارە.

**شکۆ**: هێبەت و دەنگ، سەروەری، تەورەنگ، نەنگ، دەبدەبە، تەنتەنە، سام، سامان، گەورەیی، تەمتراق، تەم و فیز. بەـــ: بە دەبدەبە، هەیبەدان، بەربچاف، پێش بچاف.

**شکۆفە**: خونچەی هەموو جوورە ڕووەکێکییە، (ئەردە.) وول. شادی، خۆشی. تەنگوستیلەیەکە نقێمی وی لە گەوهەرانی ڕەنگاوڕەنگ و جووراوجوور بێ.

**شکۆفەخەنە** (ئەردە.): فینیقچە، (ئەردە.) وولچە، لە دەست و پێ وەکو گوڵ خەنەی لێدەنێن.

**شکۆفیانەوە** (ئەردە.): پشکوتن و گەشانەوەی خونچەگوڵ، گەشبوونەوە، پشکووتن، شادمان بوون.

**شکۆک**: تەبەکی داری.

**شکۆکە** (باک.): هەرمێ کێویلە.

**شکۆە**: شکۆ.

**شکۆفەی خەنە**: ئەو گوڵانەیە، کە بە خەنە لەسەر دەست و پێ دەکرێ.

**شکۆفەی خورما**: هێشووی خورما.

**شکۆفیانەوە**: کرانەوە، گەشبوونەوە. شاد و کەیف خۆشبوونەوە.

**شکووک** (باد.): هەرمێ.

**شکوولک** (بار.): تێکوڵ و قەپێلکی گوێز و بادام و ئیترە. (باد.) شکولک.

**شکیاگ**: شکاو.

**شکیان**: شکان. شکیانەوە، داهاتن، خوواربوونەوە. تلیشیان، ترەکیان، درزبردن. بەزین، هەڵهاتن.

**شکیانەوە**: شکانەوە. شل بوونەوە، خاوبوونەوە. دوواوەدان، لاوازبوون.

**شکێر** (باک.): بەردەلان، زوورگ، کۆتای ووردەبەردان. شوێنێکە بەردی زۆر بێ و بەسەریەکدا کەوتبێ، شکێڕ. (باک.) کاول، وێران، کەمباخ.

**شکێر** (زێ.): چیایەکە سەخت و بلند و چەتوون بێ. شکێر.

**شکێڵ** (هەورا.): نەشکێڵ.

**شکێن**: شکێنەر.

**شکێناندن**: شکاندن. بشکێنە.

**شکێنەر**: شکێن.

**شکێلووک** (باد.): تیکوڵ.

**شل**: ئاودار، نەرم، ئاوەکی، (سوور.، ژە.، بۆتا.) بەناو، تەڕ، شل و شەهت، شل و شەل. ـــ کرن: تەڕکردن. (سوور.، ژە.، بۆتا.) گرێو، مەرج. خاو، فش، بەرواژی توند و پەیتییە. چتی ڕوونی تراو. شەل، لەنگ. بێ هێز. دەستم ـــ بوو: هێزی تێدا نەما. دوو، مەیدان، ماوە. ـــ کردن: لە دوودان، بەدەمەوەدان. خاو، سست، تەنبەڵ. ئەو بزمارە یا ئەو سنگە شلە، واتە لەقە، قایم نیە.

**شڵ**: سوورهول. (موک.) بەڵەک، شڵە. (بابا.) سووروفش، سووروسپی ناپەسند، پلپل، پەڵەپەڵە، ماری پلپل، بەڵەک.

**شلاتی**: تەڕاتی، تەڕایی.

**شلاڵ**: کۆکی دروومان. گیاندارێکە لەبەر جەور و هەنگامەی جیهان یا نەخۆشی و ئازار لە گیانەلڵا دابێ و پشووێکی مابێ.

**شلاڵە**: شەلاڵە، کۆک. جوورە دروومانێکە.

**شلانە** (ئەردە.): شێلانە، قەیسی.

**شلانەبادام**: قەیسی بادام.

**شلانەکوت**: (ئەردە.) قەیسی ووشک کراوە.

**شلانەی بێشەخۆشە**: قەیسی هەڵووژێنی.

**شلە**: خۆراکێکە ئاوداربێ وەکو شلەساوار، شلەبرنج و ئیتر. جوورە پارچەیەکی سووری تەنکی شاشە ژنان دەیکەنە پۆشاک.

**شڵە**: سوورێکی پنۆک پنۆکە، تەبڵەق. سپێکە پەڵەپەڵەی سووری تێدابێ. (جا.) گیایەکە بنەکەی سەلکە وەکو پیوازییە و گوڵیشی سپیە. بەڵەک.

**شلەبرنج**: شۆرباوبرنج، لەپەی برنج.

**شلەپان**: شڵەقان.

**شلەپاندن**: شڵەقاندنی ئاو و شلەمەنی. هەڵشاوتن.

**شەلەپەتە**: (خۆ.) شەحتۆ، (دزە.) شەتحۆ. خاو و سست و شۆڵ و بێکارە. خووێری، ولوول، شلک.

**شلەپین** (باک.): هەڵخلیسکان.

**شلەتێن**: شیرەتێن، چتێکە کەمێک گەرم بێ.

**شلەجاف**: جوورە لەوەڕێکی زۆر باشە بۆ ئاژاڵ.

**شلەجاو** (ئەردە.): جوونی چت زۆر بە ووردی و نەرمی.

**شلەحەیحەی**: مەبەس لە چتی شلی ناشیرینی ناخۆشە.

**شلەختە** (ئەردە.): شلەپەتە، تەمبەڵ.

**شڵەژان**: شێوان، تێکچوون، چڵەکان، داچڵەکان، سەرلێ تێکچوون، ئاژاو، پەشۆکان.

**شڵەژاندن**: چڵەکاندن، داچڵەکاندن، شێواندن، پەشۆکاندن.

**شڵەژاو**: چڵەکاو، داچڵەکاو، پەشێواو، تێکچوو، شێواو. (ئەردە.) لاژک، کەسێکە قسەی هەڵیت و پەڵیت بکات. ـــ ی: هەڵەداوان، قسەی هەڵیت و پەڵیت کردن.

**شڵەژە** (ئەردە.): شڵەژاو، شپرزە.

**شڵەژین**: شڵەژان.

**شڵەژیو**: شڵەژاو.

**شلەسافار**: شلەساوار، لەپەی ساوار.

**شلەساوار**: چێشتێکی شلە بە ساواری لێنرابێ.

**شلەشاری**: شارستانی خاووخلیچک.

**شلەشل**: خاوەخاو.

**شڵەشڵ** (ئەردە.): تلەتل، سووربوونەوەی ڕوو و ڕوخسار، گەشبوونەوە.

**شڵەقان**: جوولانی شلەمەنی لەناو قابێکی و ئیتردا. (خۆ.) شەپان، شەقران، گرژین. تێکچوون، شێوان.

**شڵەقاندن**: گرژاندن، شەقراندن، (خۆ.) شەپاندن، ڕاوەشاندن، جوولاندنی چتی شلە لە مەشکە و چتی تردا.

**شڵەقانن**: شڵەقاندن.

**شڵەقاو:** چتێکە شڵەقابێ.

**شڵەقاورمە:** چێشتێکە لە قەیسی و کشمیش و گۆشت دروست دەکرێت.

**شڵەقیاگ:** شڵەقاو، ژەنراو بۆ مەشکە و ئیتر. (ئەردە.) رزیو، گەنیو، بەسەریەکداچوو وەکو میوەی رزیو.

**شڵەقیان:** شڵەقان.

**شڵەقیو:** شڵەقیاگ.

**شڵەقین:** شڵەقان.

**شڵەک** (باد.): چێشتی شلە. شلکێنە.

**شڵەمار:** ماری بەڵەک، مارێکە شڵ و پیس و ناشیرین بێ.

**شلەمەنی:** (باک.) رۆهن، ئەوانەی، کەشل و روونن و پەیت نین.

**شلەوبوون:** شل بوونەوە، سست بوون. ـــ کردن: شل کردن، سست کردن.

**شل بوون:** بێ هێز و سست بوونی ئەندام و لەش. لەق بوون.

**شل بوونەوە:** خاوبوونەوە، سست بوونەوە.

**شلپ** (باک.): شلپین.

**شڵپ:** مشتێک ئاو، کە بە دەم و چاودا بدرێ ـــ ەی دێ یا بەدوودەستان لە کراسی ئەردان.

**شڵپاندن:** شڵپەکردن.

**شڵپەین:** شڵپاندن.

**شڵپاو:** شەپۆی ئاو، لیپاو.

**شڵپە:** دەنگی چتێکییە لەناو ئاوێ هەڵکێشرێ یا لە ئاو بکەوێ، چلپە، شرک. چێشت و گۆشتی زۆر لەماڵی دارای ـــ یە. دەنگی چتێکییە، کە لە چتێکی بدرێ وەکو گوللە وەلەش کەوێ.

**شڵەشڵپ:** شەپەشەپ، دەنگی ئاوییە، کە چتێکی تێهەڵکێشرێ یا تێی کەوێ.

**شڵپ و کوت:** شڵپە و گرمەی لێدان، وەستا ـــ شاگردەکەی داگرت.

**شلپین** (باک.): راپەرین، ئەردەست. هەڵاتن.

**شڵتاخ:** تەشقەڵە، بوختان.

**شڵتاو:** (رەوا.، سوور.) شڵێوە، بارانە و بەفرێکە پێکەوە بارێن، جلیتاو، بەفرێکیشە لەکاتی تووانەوەدا.

**شلەتێن:** شیلەتین.

**شڵتە** (باک.): دۆشەگ.

**شڵخە:** شەڵغە، پوورەی هەنگە، شڵغە.

**شڵغە:** شڵخە، پوورەی هەنگ.

**شلف** (باک.): ئاسنە تیژەکەی سەری رمبانە. (باد.) نووکی خەنجەر و کێرد.

**شڵفە** (ئەردە.، کە.): لمووزی بەرازی، شفرەی بەراز. (کە.) لیپۆز.

**شلفە:** شڵخە، پوورەی هەنگان.

**شڵقە:** دەنگێکە وەکو دەنگی مەشکەی وایەلەکاتی ژاندنیدا.

**شلقاندن:** شڵقاندن.

**شلقە:** شڵپە، چڵپە.

**شڵقەشڵق:** شڵقەی یەک لەدووای یەکتری.

**شڵق و هۆڕ:** شڵقەشڵقی زۆر.

**شڵقیاگ:** فلیقاوەوە. شڵەقاو، ژەنراو.

**شلک:** ناسک، نەرم، ساوا، خاو، تەرچک، خۆنەگرتوو. سست.

**شلکاسەر:** سەرەوەی ناوچاوان، شلکەی سەر.

**شلکاک** (باک.): باڵندەیێکە بەقەد کەو دەبێ.

**شلکە:** گۆلەگۆشت، نەرمە، روولەمە.

**شلکەران:** روولەمەی ران.

**شلکەی سەر:** شلکاسەر، شیلک، سەرمەلاشوو، (باک.) شنک.

**شلکەگووێ:** بەڵگەی گووێ.

**شلکردن:** خاوکردنەوەی چت. خاوبوونەوە یا کردنەوەی کەسێکی بۆ پێکهێنانی ئاکارێک، کە لەوەپێش مەیدانی نەدەدا.

**شلکردنەوە:** خاوکردنەوە، تەرکردنەوە.

**شلکرن:** شلکردن.

**شلکوتی مەرگکردن:** مەبەس لە لێدانێکی زۆری وایە، کە لێدراو بگاتە سەرەمەرگی.

**شلکێنە:** ئەشکێلە، (رەوا.) ئەشکیرک، (بابا.، شار.) کزێنکە، ئەشکێڵکە، هەویری شل و هێلکە بە کەوچکی لەسەرساجی رۆدەکرێ و لایەکی دەبرژێ و دەکرێتە کوللێرەیەکی تەنک دووایە دەخرێتە نێو رۆنەکەوە و دەخورێ، وەکو کەلانە.

**شلکی:** هەویری هەڵاتوو لەسەر سێڵی دەکەنە نان و گۆیا شلک و نەرم دەمێنێ.

**شلنگ:** شێلنگ. تەکان و هەڵمەت. (باک.) جوورە کاڵەکێکی ئاوی ناخۆشە.

**شلۆپە:** لەکاتی بارانەدا شۆڕبوونەوەی ئاوە بە گووێ سوواناندا.

**شلۆر** (باد.): میوەیێکی ترشە وەک هەڵووچە.

**شلۆڤە** (باد.): شڵێوە.

**شلۆق:** شلووق.

**شلۆکە** (باک.): زۆربەبارانە.

**شلو** (باک.، دەر.): شلوێ.

**شل وشۆڵ:** (هەورا.) گێج. ژیپاڵ. شەحتۆ، شل و شێواو. پیس و چڵکن، شپ و شۆڕ، شپرێو، وازی گورج و گۆڵ.

**شل و شووار:** شل و شۆڵ، شل و شێویاگ.

**شل و شێواو:** شل و شۆڵ، مرۆی شەپ و شۆڕ و شان و مل داچەقاو.

**شل و شێویاگ:** شل و شۆڵ، شل و شووار.

**شلووق:** (موک.) بێ سەروبەر، شلێخە، ئاڵۆز، پەشێو. ئاوێتە، جەنجاڵ.

**شلووق بوون:** تێکچوون، شێوان، ئاڵۆزی، پەشێوی.

**شلووقکار:** (باک.) ئەفەجان.

**شلووقی:** خرسجر. هەرا، پشێوی، شێواوی، ئاڵۆزی.

**شلووقیاگ:** شێواو.

**شلووقیان:** شێوان، شلووق بوون.

**شلووک** (باز.): حندرحۆ، جۆلانەی دار.

**شلووکە** (باک.): بارانەی بەفراوی، شلّێوە.

**شلووکوت:** بۆ لێدان یا بۆ پارانەوە و دڵدانەوەیەک بەکاردەبرێ، کە مرۆ لەپێناویدا ماندوو و شەکەت و کفت بووبێ.

**شل وملی:** ئافرەتێکە ناسک و لەبارببێ. چتی نەرم و شل.

**شل و وول:** شل و مل، سست، خاو.

**شلوێ:** کرژین، لێڵ، شێلوو، شێلوێ، ناوی لێڵ، (دەر.) شلوو، (هەورا.) لێلاو.

**شلوێ کردن:** گرژاندن.

**شلە:** دەستەمێش هەنگوینێکە. شەخە.

**شلێخە:** بێ سەروبەر، شلووق.

**شلێر:** گوڵەشلێر، گوڵبزن، هەلاڵەبرایمە، گوڵێکی بەهارییە گوڵی وەکو لاولاو و بنەکەشی وەکو سەلکەپیوازی وایە. ئێوی مەحاڵێکیشە لە نزیک پێنجووین پێی دەڵێن(شلێر و ئاوخوان).

**شلێقاندن** (باد.): فلیقاندنەوە.

**شلێقیاگ** (باد.): فلیقاوەوە. فلیقاوەوە و ڕزیو بۆ شووتی و ئیتر.

**شلێقیاگ** (ئەردە.): فلیقیان.

**شلێل** (باک.): جوورە گەفێکە یا جۆیەکە. ئازا، پردڵ، بەجەرگ.

**شلێوە:** (موک.) بەفرێکە بەدەم بارانەوە بباریێ، (ئەردە.) دوودانک، شلووکە، (باک.) بەرخورک، دووان، لیلاف، (زەن.) ژیل، (شار.) بەفروپشۆ، شلۆقە.

**شلێویان** (ئەردە.): ئاژاوە، تێکچوون، ژلێویان، شێویان.

**شلی** (باک.): ڕۆژی بە باران و بەفرە، ئیمرۆ ــ یە: بارانە دەبارێ یا بەفر. شلاتی.

**شلیتک** (باد.): تەناف.

**شلی و شەپلی** (باک.): زۆری.

**شلیخە** (باد.): شڕوشڕۆل، بێ سەروبەرە، کەمتەرخەم، چناڵ. شۆخ و شەپاڵ.

**شلیماتک** (باک.): بە پەردە داپۆشراو، پەردەپۆش.

**شلینگ:** شێلینگ.

**شمادان** (باک.): مۆمدان، مێودان.

**شمارە:** ژمارە، دانە.

**شماردن** (ئەردە): ژماردن. وادانان، وەزانین.

**شمارۆن** (زا.): مێوبڕۆن.

**شمامۆک** (باد.): شەمامۆلە.

**شمە** (هەورا.): ئێوە، ئەنگۆ، هوون، هنگ.

**شمبلیلک** (باد.): شەملی.

**شمتن:** شووتی.

**شمتوو** (باد.): شووتی.

**شمتی** (باک.): شووتی.

**شمتین** (باک.): هەڵخلیسکان.

**شمش:** سپڵ، سی گیاندار.

**شمشاد** (باک.): جوورە بلوێرێکە، لوولک، شمشاڵ، جوورە دارێکی بێ گرێ و گۆڵە کەوچک و ئامانی لێ دروستدەکرێ.

**شمشاڵ:** لوولک، شمشاد. دارێکە. دووزەلە، مرازێکی موزیقەیە، لوولە.

**شمشە:** سوواخ، کاکڵ. (موک.) ئاوارە. گەوهەری زەبر و هێزی برووسکێیە. (بار.) چەنێ. دارێکی چوارگۆشەی ڕاستە وەستا بەکاری دێنێ بۆ ڕاستی سوواخ لە هەندێک شوێنان وەکو تیرۆکی وایە.

**شمشەکاری:** سوواخێکە، کە بە هۆی شمشەوە کرابێ.

**شمشێر** (هەورا.، فە.): شیر (تیغ).

**شمشیرە** (موک.): مرازێکە لە کەرەستەی جووتی، (بل.) شیرەپەە. شاپەڕە، پەڕەدرێژەکانی باڵندانە. دۆریخی دەرگا. (هەورا.) گۆڵەی دەرکێ.

**شمشیرەکووا** (هەورا.): چەکچەکیلە.

**شمشێرەی کێوان:** (هەورا.) تیشەبەرد، تاش.

**شمشیرچێوین:** شیری خەتیبی.

**شمشیرکرۆژ:** شیرکورۆژ.

**شمشیری** (بابا.): جوورە ترێیەکە.

**شمقار:** باڵندەیەکی گۆشت خۆرە وەکو باز و شەهێن وایە گەورەیە و تیژباڵە.

**شمک** (باک.): کاڵەی چەرمەگا و ئیتر و بەکەوشێکیش دەڵێن کەچەکبێ و پشت پانیەی نەبێ. (باک.) سەندەڵ، دارێکە لە هیندوستان. سۆل.

**شملتی** (قەرە.): بەرمووریکە لە مێخەک و سمل و گوڵەباخ منداڵان لەملی خۆیانی دەکەن.

**شملی:** شەدانە، حەوینج، گیایەکە بڵند هەڵدەچێ لە نێوقەدیدا کەمێک خووارە، گوڵی سپی ووردە لەسەرەوە دەردەکات. شملی کەوی لەگەڵ ڕەشکەی بەنانی وەردەکرێ وەکو کاخلی وایە ڕەنگە هەر کاخڵ بێت. ئەگەر ــ بۆ بدرێ و بکرێتە ئارد و نان و بە شیری کاڵ بخورێ بۆ زەحیری داران زۆر باشە. شەنگلە، چتێکی بۆنخۆشە وەک زیرە وایە بەسەر ناندا دەکرێت. بڕوانە شملی بەرەکەت.

**شملیە** (هەورا.): شملی.

**شملی براکە:** شەنگلە، شەنگلە بەرەکەتە.

**شملی بەرەکەت:** شەنگلە بەرەکەت. دوودانە بەری هەرداریکی، کە پێکەوە نووسابن.

**شمما:** (بۆتا.): مێوی هەنگوینی.

**شمۆرتک** (ئەردە.): چتێکە، کە گوترا هەر مەبەست لەخۆی بگەیەنێ و هیچی تر.

**شمووز:** چەمووش.

**شن:** دارێکی شین و جووان و کورتە بەقەد هی شیلان و گوڵی گوڵاوێ بڵند دەبێ، تێکوڵی سپیە هەمووساڵێکی فرێی دەدا و هی تازە دێنێتەوە بەری سوورە وەکو قەزوانی وایە ناخورێ، هەر لکێکی ببڕی دەتوانی شیشەی لەنێوە رووکەکەی ڕابکەی چونکوو نێوە رووکەکەی نەرم وەکو کلۆری وایە.

**شناس:** ناسیاو، ئاشنا.

**شناسای** (هەورا.): ناسین. ـــ ی: ناسیاوی، ئاشنایی.

**شناسنامە:** پەڕاوێکی گچکەیە ناونیشان و جێگا و ڕێگای خاوەندەکەی تێدا نووسرابێ.

**شناسنای** (هەورا.): ناساندن، بە ناسیندان.

**شناسی:** ناسیاوی، ئاشنایی.

**شناسیار:** ناسیاو.

**شناسین:** ناسیاوی، ناسین.

**شناک** (باک.): دارێکە.

**شنان** (فە.): ئەسپۆن.

**شناو** (کە.): جوورە یارییەکی زۆر خانەیە، شنۆی زۆرخانە. مەلەکردن، خۆشوشتن.

**شناوە** (کە.): کەمە کشتوکاڵێکە، پەڵە کشتوکاڵێکی گچکە، شکارتە.

**شنە:** کزەبا، ـــ ی بای لە سۆزە بەهێزترە. (هەورا.) شنۆ. تازە پێهەڵگرتن و کەمکەمە ڕۆیشتنی منداڵانە. بە ـــ شن دەڕوا.

**شنەرەک** (باک.): (باک.) شناک. دارێکە.

**شنەشن:** (کە.، دزە.) بۆران، بارانێکە بە دەم باوە، شنەی یەک لە دووای یەکتری. بۆ ترووسکانەوەی گیاو جووڵانەوەی منداڵانیش بەکاردەبرێت.

**شنەفتەی** (هەورا.): بیستن.

**شنەفتن** (ل.): بیستن، ژنەفتن.

**شنەگ** (ئەردە.): کەل و پەل، چتمەک.

**شنەوا:** بیستەر، بیسەر، ئەژنەوا، ژنەوا.

**شنەوتن** (کە.، فە.): بیستن.

**شنەڕێ** (هەورا.): گەمەیەکە.

**شنەوڵ:** خراو، خراپ، گەند، ناباش.

**شنک** (باک.): شلکەی سەری. دانەوێڵەیەکە سەوز بووبێ بەڵان هێندە بڵند نەبووبێ، کە وولاخ لێی بلەوەڕێ.

**شنکی:** شەن.

**شنگ** (سەق.): ئەسپنگ. (باک.) شرنک، دەنگی ئاسنییە یا هی تەقەی تفەنگێیە. (دزە.، خۆ.) هێز، توانا، ووزە. هێندە ماندیە ـــ م لێ برایە.

**شنگالی** (باک.): جوورە تفەنگێکی خەتخەتە.

**شنگەبی** (باک.): شەنگەبی.

**شنگەشڕ** (ئەردە.): سپیاڵ، کۆنە.

**شنگەل** (باک.): دارێکە.

**شنگروشیواڵ:** پرپاتاڵ.

**شنگینی** (باک.): ماڵوو (هی جووتی).

**شنۆ** (هەورا.): شنەی با، بای خۆش و فێنک. هاتنی با. جوورە جووڵاندنێکی تایبەتی ئەندامە پاڵەوانان بۆ بەهێزکردنی ئەندامیان دەیکەن. شارێکی گچکەیە لەلای ڕۆژاوای شاری سابلاخێدا.

**شنووت** (ئەردە.): داری دارەڕایە.

**شنیان:** شنینەوەی منداڵ. خەرامیان، هاتنی با و چتی تر.

**شنین** (ئەردە.): شنیان، خەرامین، هاتنی با.

**شنینەوە:** گۆشەکردن و شنەشن کردنی منداڵ، لەرینەوەی درەخت.

**شۆ:** دەقاقی کر و چیت و پارچە و ئیتر. چتێکی لیچقە (کەتیرە) جۆلاو تەونگەران بۆ دەقاقی چیت و پارچە و کرانی بەکاردەبەن. (باک.) شوشتن. مێرد، شوو. (گەرمێن) کێلانی یەکەمین جارە لە پاییزێدا تا گیا و گۆڵ ووشکبن. (موک.) شێو، شێوەرد. ـــ کردن: شێوکردن. ئاشێڤ، ئاشەڤ، شێڤ. (کر.) هێڵەبرکێ. وەرد، شۆم، شووڤ. چتێکی لینچە وەکوو کەتیرە و ئیتر لە هەندێ تەنراو دەدرێ بۆ ئەوەی دەق ڕاوەستێ. ، چتی غدار، نم، شێ.

**شۆب** (باد.): بەڵگە و ڕێ و شووێنی چت. (کۆ.) مرازێکە لە شەی تەونی دەدرێ، کەرکێتی تەونییە.

**شۆباو:** شۆرباو.

**شۆبە** (باد.): بێهۆش بوون لەبەر نەخۆشی.

**شۆپ** (ڕۆژ.): لێدان، شەپ. لەخشتەبردن. ـــ لێدان: لەخشتەبردن. تیکە و پارووی زل. (باک.) شووێن. ـــ کرن: خەت لێدان.

**شۆپاژۆ** (باک.): شوێن ناس، شووێن هەڵگر، کەسێکە، کە شووێن پێ هەڵگرێ.

**شۆپەکان:** جوورە گەمەیەکی ژنانەیە. (کە.) شۆپەکی.

**شۆپەکی:** شووپەکان، گەمەیەکە.

**شۆپک** (باک.): گۆڵەی دەرکێ.

**شۆپگەڕین** (باک.): شووێن هەڵگر.

**شۆت** (هەورا.) شیری گیان لەبەرانی مێیینە.

**شۆت پەرزن** (هەورا.): شیرپاڵێو، پاڵووێنە، شیرپاڵۆک.

**شۆتک:** شۆرتکە. (باک.) پشتێند.

**شۆتکە:** شۆرتکە.

**شۆتیلە:** (هەورا.) گیایەکی بەهاری شیردارە لە ساڵمە دەچێ.

**شۆتین** (هەورا.): چێشتی شیربرنج.

**شۆتینە** (هەورا.): شیربرنج. فرنی.

**شۆخ:** لار، شەنگ، بەدەو، چالاک، ڕوواڵ، لارچاک، بالابەرز، جووان، قۆز، هەڵکەوتوو، خۆشڕوو، خۆشزووان، خەنەمران، خەرمان. شاخ، قۆچ، سەرەوشاندنی گا و بەران و بزن. شۆق.

**شۆخە ئەندام:** لارچاک.

**شۆخەل** (ڕەوا.): شەخەل.

**شۆخ و شەپاڵ:** شلیخە، چتال.

**شۆخ و شەنگ:** پەریزادە، پەریڕوو، جووان، دەلال، ڕوواڵ، چەلەنگ، لار، لارچاک. ـــ ی: جووانی، چەلەنگی.

**شۆخێ:** ناوی نافرەتانە.

**شۆخێتی:** شەنگێتی.

**شۆخی:** شەنگی، قۆزی، جووانی، چەلەنگی، بەدەوی، قەرف. گەپ، گاڵتە، یاری. ـــ پێکردن: گەپ پێدان.

**شۆخی باز:** گاڵتەچی، گاڵتەباز.

**شۆدار:** چتێکە، کە شۆی پێوەبێ. ـــ ی: شۆبوون.

**شۆدان:** ئاوکردنی هەندێ چت و غدانی و ئاهاردان.

**شۆر:** سوێر، سوێل. جوورە مەقامێکی کوردییە. گز، خرۆش، سەودا، هەوا، دڵداری (عشق)، ـــ دار: سەودادار، دڵدار. (باک.) هەرا، هەرا هەرا، جەنجاڵی. داڵگۆشت، لاواز، بێ تین، لەڕ، گیانداری زۆر ڕەوان. (کە.، باک.) ئاخەفتن، ـــ کرن: قسەکرن. گیایەکی سوێر و تاڵە مالاّت دەیخوا.

**شۆڕ:** باش، چاک، شۆخ. ـــ ەژن، ـــ ەسووار. روو لە خووارەوە، داکەوتوو. کراس و دەربێ و کەوای زۆر درێژ و شۆڕە. چتێکە، کە لە شوێنێکی بەرزەوە دارژێکە س(شۆڕ) بووبێتەوە. شۆڕی کرد: سەری شۆڕکرد.

**شۆڕابە:** بە کلکە هەورێکی دەڵێن، کە شۆڕبووبێتەوە سەر زەوی و پێیدا بباری.

**شۆراڤک** (باک.): سوێراووک.

**شۆران:** شووشتران.

**شۆراو:** شۆردراو، شۆرراو. ئاوی سوێر. شۆرباو. ئاوی گوندێک بوو لەنزیک کەرکوک. *

**شۆراوە:** شۆرراوە، شۆردراوە.

**شۆڕاوە** (دەر.): پرژ، تاڤگە.

**شۆراورێژ** (ئەردە.): شوربارێژ، دزغاو (بەناوی قسڵی).

**شۆڕاوگە:** ئاوێکە لە چتی شۆردراوەوە لەپاش هەڵخستنی کەمکەمە بچۆڕێتەوە خوواریێ. (هەورا.) چۆڕاوگە.

**شۆراوی برنج:** شۆرباوی برنج.

**شۆرە:** گیاشۆرە گرنی گرنیە، گۆپکەی ووردووردی هەیە، گەڵایەکانیشی زۆر ووردن لق و پۆپیشی زۆر لێدەبێتەوە زۆر بە زەویدا ڕادەکشێ ئیتر لە زەوییەوە بۆ حەوا بەرز دەبێتەوە بە تەڕی دەکوترێ و لەسەر برینان دادەنرێ. چتێکی سپییە وەک زاخ لەناو ئاو دەکرێ بۆ جل شوشتن و باروتیشی لێ دروستدەکرێ بە ئاوەکەی خارشتی پێ بشورێ چاکی دەکاتەوە، لەگەڵ نۆشادریش مسی پێ سپی دەکرێتەوە. باروتی پاک نەکراوە، خوێیەکی سوێر و تفتە و گرگرە لە ئاگری نزیک کەوێ گر دەگرێ.

**شۆڕە** (خۆ.): مەڕ، بەرخ یا کاوڕێکە دووگی لەسەر قارچەی بخشێ و شۆڕبێ. چۆڕە. ـــ بێ: شەنگبێ، جوورە دارە بییەکە لکەکانی سەر شۆڕ دەکەنەوە بەرە و زەوی یەکێکە لە چوار جوورەکانی داربێ.

**شۆرەر:** ئەو کەسەیە، کە چت یا گیان لەبەری بشووات.

**شۆرەزار:** شۆرەکات، زەوییەکە خوێی زۆربێ.

**شۆڕەژن:** ئافرەتی شۆخ و شەنگی جووان.

**شۆڕەسووار:** سووارچاکێکە پۆشاکی جووان و شۆڕی لەبەر دابێ و بەسەر زینەکەدا هاتبێتە خووارەوە.

**شۆڕەشۆڕ:** چۆڕەچۆڕ.

**شۆرەک:** زگچوون و فیراندنی وولاّخ و ئاژالاّنە. (زا.) شۆرەکات، زەوییەکە خوێتاوی بێ و بە کاری چاندنێ نەیەت.

**شۆرەکات:** شۆرەزار، زەوییەکی زیخاڵ و کەفی سپی و سوێری هەبێ و گیای لێ شین نەبێ.

**شۆڕەمەی:** مەعریفەت.

**شۆڕەووبووگ** (ئەردە.): شۆڕبووەوە، داڵۆچڵە، ئاوێزان.

**شۆڕەووبوون:** شۆڕبوونەوە، داڵۆچیان، داڵۆسکەبوون.

**شۆربا** (هەورا.): شۆرباو.

**شۆربارێژ:** دزغاو کردنی خانوو، حەوز یا ئەستێڵە بە گێچ و قسڵ و چیمەنتۆ.

**شۆرباو:** شۆربا، مەدفینی، (باک.) مەدفوونی، (بۆتا.، زا.) مەدوونی، فرد، گەرمک، ئاڤدونک، ئاڤگۆشت، شۆربە.

**شۆرباو:** چێشتێکە ئاوی لە دانی زۆرتربێ.

**شۆرباودان:** شۆربەدانک.

**شۆرباورێژ:** دزخاوکردنی شوێنێک بە گەچ یا بە چیمەنتۆ یا بە قسڵ.

**شۆرباوی** (هەورا.): شۆرباو.

**شۆرباوی سیری:** ئاڤسیرک.

**شۆربە:** شۆرباو.

**شۆربەدانک:** شۆرباودان.

**شۆربەشیر:** شۆرباوی شیری.

**شۆربەنیزک** (باک.): نیسکێنە.

**شۆڕبوونەوە:** داکەوتن، روو لە خوواریێ کردن، بەربوونەوە.

**شۆڕبووەوە:** شۆڕەوبووگ.

**شۆرتان** (باک.): جوورە پەنیرێکە.

**شۆرتک:** (کە.) جوورە کەزۆێکی باریکە دەکرێتە سەرکەڵلەی وولاّخان. شۆرتکە.

**شۆرتکە:** شۆرکە، سەرشۆرکە، سەرشۆرتکە، سەرشۆرتک، شۆرتک. جوورە پشتێندێکی جووانی پانی ئاوریشمینە.

**شۆردراو:** شۆراو، شۆرراو، شوشتراو.

**شۆردن:** شوشتن.

**شۆردنەوە:** شتنەوە.

**شۆڕش:** بەزاج، سەرپێچان، نەکێشان. (باک.) پشیوی، لامۆفەک. هەرا، ئاژاوە. ـــ کردن: سەرخووەڕابوون.

**شۆڕشگە:** جێگای شۆڕش.

**شۆڕشگێڕ:** کەسێکە شۆڕش هەڵسووڕێنێ.

**شۆڕشگێڕان:** سەرپێچی کردن، ئاژاوە نانەوە.

**شۆرکە:** شۆرتکە.

**شۆرکێ:** (باک.) جوورە هەڵپەڕینێکە.

**شۆڕکردن:** (هەورا.) شۆرکەردەی.

**شۆڕکردنەوە:** ڕژێشتن، دادانەوە، بەردانەوە، داهێشتن، دزڵکردنەوە.

**شۆرگە:** جێگای چت لێ شوشتن لە ماڵێدا.

**شۆرەمەزە:** نۆکی کولاّوی تێرخوێیە، سۆڵوخوا. جوورە چێشتێکە بە نۆک و جاترە و گیادانوو دروست دەکرێ وەک چێشتی دانەرۆکە، بەلاّم نەم گەغی تێ ناکرێ. چتی تێر خوێ و سوێر.

**شۆڕێ:** نێوی ئافرەتانە.

**شۆڕی**: سووێری.

**شۆڕیاگ**: داشۆڕاو، داشۆڕیاگ، چەنەدرێژ، بێ شەرم. (ئەردە.) شۆڕاو.

**شۆڕیان** (ئەردە.): شۆڕان، شۆڕدران.

**شۆڕین** (کە.): شوشتن، شتن، شۆردن.

**شۆڕینەوە**: شتنەوە.

**شۆسە**: ڕێگای خۆشکراو بۆ ئۆتۆمۆبیل.

**شۆس یەخ**: چلوورەی گوێسووانانە، کە شۆڕبێتەوە.

**شۆش** (زا.، زرا.): هەوش. تاقگە، پەرژ. (باک.) هەوش، هۆنش، بۆ ڕاوەستاندنی کەران بەکاردەبرێ.

**شۆشی** (هەورا.): سی، سیپەلاک.

**شۆش یەهەر** (هەورا.): سیی و جیگەر.

**شۆفار**: دووزمان، قسەدز، دیدەوان، دزنێرۆ. (هەو.) ئەمراگێل. نێراو، زیرەوان. بشیونە. گێرەشێوێن، چوکڵشکێن، ئاگر بەرپاکەر. (ئەردە.) بشێونە ـــ ی: زیرەوانی، دزنیرۆیی.

**شوفاریانە**: کانگا و داڵدەی شۆفاران.

**شۆفێر**: ئاژوەر، ئاژۆ.

**شۆف** (باک.): (باک.) شۆپ. شێف.

**شۆفک** (باک.): گۆڵەی دەرکێ.

**شۆق**: ڕووناکی، ڕۆشنی، شەوق، پەرداخ. بە ـــ: پەرداخدار. سەروەشاندنی مەڕ و بزن و گا. قۆچ.

**شۆق تێهەڵدان**: شەرەکەللەی بزن و مەڕ و گا.

**شۆقدار**: پەرداخدار. ـــ ی: ڕووناک بوون.

**شۆقدان**: شۆق وەشاندن.

**شۆقل** (باک.): پۆڵکە. ـــ ی چووکا: پۆڵکەی چکۆڵە. ـــ ی گا: پۆڵکەگایانە. ـــ ی مار: پۆڵکەمارانە. ـــ ی خاتوونا: پۆڵکە خاتوونە.

**شۆق لێدان**: (هەورا.) قۆچ لێدان، شاخ لێدان.

**شۆق وەشاندن**: شۆق تێهەڵدان.

**شۆق وەشێن**: گیاندارێکە شۆق بووەشێنی.

**شۆق هاوێژتن**: شۆق وەشاندن.

**شۆق هەڵدان**: شۆقدان.

**شۆک**: (کە.، سووێ.، هەورا.) دۆشاو. جوورە شیرینییەکە لەگەڵای دارەبەڕوو و مازوو دەنیشێ و دەکرێت بە گەزۆ.

**شۆکان**: شکراللە.

**شۆکە**: (بابا.، خۆ.) گەزۆ، گەزکوولە، جوورە گەزۆیەکە لە بەهاراندا، کە باری بەڵکەکانەوە ووشک نابێتەوە لەکەکان بە بڕاوی لەسەر تەشتێکی دادەنێن دەچۆڕێتەوە نێوی، کە کوڵاندیان ڕەنگی زەرد دەبێ، لە جێگا و کاتی فێنکدا دەبێ. دەڵێن داعبایەکە شۆکەی پێدەڵێن لە مێش گەورەترە لەسەر برکان بنیشێ خراپیان دەکات و تووتنیش زەرد دەکات ولەناوی دەبا. (خۆ.) بەمو چەکوچەش دەڵێن، کە بەرداشی پێدەقرنجێنن لەکاتی بیرانەکردنیدا. (موک.، کۆ.) تمێکی شیلاوییە لەسەر هەر دار یا شیناوەردێکی بنیشێ تێکی دەدات و ووشکی دەکا.

**شۆکێ** (ئەردە.): کورتکراوەی شکراللە یە.

**شۆگیی**: (هەو.) شۆخی، شانازی. (کۆ.) هەڵشەنگاندن. خۆبە گەورەزانین. فیز، هەوا.

**شۆڵ**: سووێر، هەمیشە لە دووای (شل) ەوە بەکاردەبرێ وەکوو شل و شۆڵ واتە زۆر شل، خاو.

**شۆڵاو**: سووێراو.

**شۆڵاف** (باک.): (باک.) شۆلتاف. سووێراووک، ئاو و شۆرباوی سووێر.

**شۆڵە** (ئەردە.): هەورەبرووسکە، برووسک. کەپەبێڵی قوڕ، بەشە قوڕێکە، کە بەدەمی بێڵ هەڵگیرێت.

**شۆڵەناگر**: گڕ و ڕووناکی ئاوور.

**شۆلەچرا** (ئەردە.): چۆلەچرا.

**شۆڵەکە**: دەفرێکی دوولاییە لە جەواڵ گەورەترە لە هەوڕ گچکەترە لە خووری دروست دەکرێ.

**شۆڵەمە**: (بابا.) دومەڵێکی لەشییە، کە ئەستوور و داکەوتبێ، بۆ هەموو چتێکی ئەستوور و قورس و داکەوتوو بەکاردەبرێ.

**شۆلک** (باک.): کوتکی جلشووشتنییە. شۆنک. ماش، گیاماش.

**شۆم**: (کە.) وەرد، شۆ، شۆو. زەوی کێڵراو. ـــ بڕین: شۆوبڕین. (هەورا.) کۆن) ئێوارە.

**شۆماڵ**: کەسێکە غێکی شیلەدار و چەسپ لە کران بدات تا ڕاست ڕاوەستن.

**شۆن**: (ڕۆژ.) جێ، جێگا، شووێن. دووا، چووە شۆنی: چووە دووای. داوا، خووازتن. بە ـــ یدانارد: داوای کرد، خووازتی.

**شۆناڕۆیین**: بەشووێنداچوون.

**شۆنزانی**: شووێن ناسی، شووێنەوار زانی.

**شۆنک**: کوتکی جلشوشتنێ.

**شۆنکەفتن**: بە دوواداچوون. بە گووێ کردن.

**شۆنکۆمەکی**: شۆنگومکێ.

**شۆنگومکێ**: شووێنەوونکێ، شووێنەوونی، پەی گومکێ.

**شۆنگێل** (هەورا.): پشکنەر.

**شۆن نیان** (ئەردە.): شووێن خستن، ڕاونان، تەرەدووانیان.

**شۆنهەڵکردن**: شووێن هەڵگرتن.

**شۆن هەناردن**: بەدووانااردن، داواکردن، خووازتن.

**شۆن یەک**: بەدووی یەکتریدا.

**شۆو**: شوو، شۆم، زەوی کێڵراو، شۆ، شێف.

**شۆوبڕین**: شۆبڕین، شێڤبڕین.

**شوبات**: مانگی دووەمە لە ساڵی ڕۆژی، کە لە ناوەندی کانوونی دووەم و مارتی دایە. (٢٩) ڕۆژە لەساڵی کەبیسەدا و (٢٨) ڕۆژە لە ساڵانی دیکەدا.

**شوتک** (بار.): پشتێند.

**شوتور** (فە.): ووشتر.

**شوستوشۆ**: شتن، شوشتن.

**شۆست و شۆدان**: مەبەس لە سەرزەنشت و سەرکۆنە کردنی یەکێکە.

**شوسه** (ئەردە.): شۆراو، پاک.

**شوسوشۆ**: شوستوشۆ.

**شوش** (هەو.): سپیەلاک، سی.

**شوشتەری**: جوورە بەرەیێکە لە دەزوو دروستدەکرێ.

**شوشتن**: ششتن، شۆرین.

**شوشتەری کوردی**: جوورە هەوایەکی گۆرانی کوردییە.

**شوغال** (لو.): چەقەڵ.

**شوقاق** (ئەردە.): شوقاقی.

**شوقاقی**: بروانە: شقاقی، دەردێکە لە چوارپەلی ووڵاخان دەدا شەقارشەقاری دەکات.

**شوقەلەت**: چتێکە وەک سەکۆیەکی باریک لای سەرووی ژوورەوە دروستدەکرێ ژێرەکەی چۆڵ و خانەخانەیە چتیان لەناو دادەنرێ و چتمەکیشی لەسەر دادەنرێ.

**شوک**: خرنووک.

**شوکر**: سوپاس، رەسپ.

**شوکرانە**: سوپاس، رەسپ.

**شوکرانە بژێر**: سوپاسکار. ــ ی: سوپاسکاری.

**شومۆرتک** (ئەردە.): چکۆ، کەمێ، نەختێ، تۆزێ.

**شوناس**: شناس. ــ ی: شناسی.

**شوهوور** (ئەردە.): شوو، شووڵ، تووڵ.

**شوو**: شووڵک. (باک.) رەفتار، شێوەی رۆیشتن. (رەوا.) کیری ووڵاخ و ناژاڵان، چوو. مێر، مێرد، هاوسەر، هارخەف. (کە.) وە ــ بەمێرد، بەشوو.

**شووا** (باک.): تاژۆتن، لێخوڕین.

**شووار**: شوشتن، شتن. ــ ی سابوون: شووشتن بە سابوون. (هەورا.، کۆ.)

**شووارۆ**. (هەورا.) نەزڵە. ــ ی سابوونی: چۆنیەتی و باری شوشتنی کاڵا بە سابوون.

**شووار** (رەوا.): (رەوا.) شووڵ، تانۆک بۆ تەنین و پەرژین. کیری ووڵاخ و ناژاڵان.

**شووارای** (هەورا.): کوشین.

**شووارشینک** (پژ.): چەقاڵە.

**شووارک**: (شەم.، دزە.) شووڵک.

**شووارگرتن**: تەماشای نزڵە کردن بۆ زانینی لێدانی دڵ.

**شووارۆ**: (هەورا.) دای وەنە، (هەورا.، کۆ.) نزڵە، شووار. ــ گرتن: نزڵەگرتن.

**شوواشبیک**: دارێکی هەمیشە سەوزە گەڵای وەکو گەڵای مووروەدە بەرەکەشی وەچوواڵە بادامی دەچێ.

**شوواشینک**: دارێکی کێوییە بەرەکەی هەر وەکو بادامە و تاڵە، بە کوڵاری لەناو خورێواوکێدا خۆش دەکرێ. (باد.) جوورە ترێ و هەنجیرێکە.

**شواڵ** (فە.): دەرپێ.

**شوواڵ** (ئەردە.): شەرواڵ.

**شووڵەشین**: کاڵەشین.

**شووڵپیس**: شەرواڵ پیس.

**شووڵشینک**: کاڵەشین.

**شووڵک**: خەڵفەدارێکی تازەی باریک و درێژە، کە لەناو چەند خەڵفێکی تردا هاتبێتە دەرەوە، شووڵک.

**شووان**: نێوی کورانە و نێوی هۆزێکییە لە نزیک کەرکوک، لە کوردستانی باشووردا، (فە.) شوهان، شڤان. (زەن.، لو.) چۆپان، (باک.) بەرڤان، مێگەلەوان، گەلەوان، ران لەوەرێن، رەمەوان، شووانکارە.

**شووانانە**: چتێکە بدرێ بە شووانان.

**شووانە** (هەورا.): شووان.

**شووانەوکاوورا** (هەورا.): بەرخەوان.

**شووانەوگاوا** (هەورا.): گاوان.

**شووانەو ووشتر** (هەورا.): ووشترەوان.

**شووانەوێڵە**: نەزان، گەوج.

**شووانخەڵەتێنە**: باڵندەیەکی چکۆڵەیە هێندەی رەشۆڵەیە خۆی مات دەکات تا نزیکی نەکەون نافڕێ، کە فڕیش دیسان هەر لە نزیک دەنیشێ تا نزیکی نەبنەوە نافڕێ، شووانەخەڵەتێنە، شڤانشتەغلینەک، شڤانشتەغلیک، چڤک، قوشەکلاونە.

**شووانشووان** (ئەردە.): جوورە یاریەکی منداڵانەیە.

**شووانشووانێ**: گەمەیەکی منداڵانەیە.

**شووانشووانەکێ**: شووانشووانێ.

**شووانکارە**: دوورکەس، کە ماڵاتیان تێکەڵ بە هی یەکتری دەکەن و هەر کامێکیان، کە بەخێویان بکات دەبێتە ــ. ران بە تەرازگرتن و مێگەڵ بە نیوەیی. تیرەیەکە لە جاف. ــ یی: شووانیێتی.

**شووانکیلە**: گیایەکە شیرەکەی دەبێتە جیل (لاستیک).

**شووانەخەڵەتێنە**: بروانە شووانخەڵەتێنە.

**شووانێتی**: شڤانیێتی.

**شووانی**: شڤانی.

**شووبرا**: (موک.) هێوەر، برای مێردی ژنییە.

**شووبرازن**: هێوەرژن.

**شووپ**: ئەندازەیێکی زۆر، کۆما، خەرمان.

**شووپایی** (ئەردە.): بارێکە سووکەڵەیە لەسەر پشتی ووڵاخی دادەنێن و خاوەندیشی لەسەرییەوە سووار دەبێت. تەمەلیت، تەلیسە.

**شووپەکان**: جوورە گەمەیەکی کچانە. ــ ئەمن و ئەتۆ: ــ پێچکم دەتۆ.

**شووت** (باک.): لووس، چتی لووس. (هەورا.) شیر. (ئەردە.) شات و شووت، لاف، خۆ هەڵکێشان، هووشە، شووتە.

**شووتە**: بروانە: شووت.

**شووتک** (زا.): شۆرتکە. (باک.) پشتێند.

**شووتشووتانێ** (هەو.): جوورە گەمەیێکی منداڵانەیە.

**شووتی**: (هەو.) شفتی، (باد.) شمتی، شتی، (بل.) شمتوو، (هەورا.) هەنی، (دەر.) شامی، (نەغەدە) شیتوو، (شن.) شووتوو.

**شووتیەکۆڵە:** شووتی کۆڵە، شووتی گچکە و گەیشتوو.

**شووتی کۆڵە:** شووتیەکۆڵە، شووتی گچکە.

**شووتیلە:** گیایەکی بەهاری و شیرداره وەکو گیا ساڵمەیە.

**شوودان:** بەمێرددان.

**شوودۆش:** مێرد پەرست.

**شوور** (ڕەوا.): گاکێوی، (بابا.) فیلەگێژە، خەرگۆلک، (باک.) شقری. (باک.) شیر (تیغ). (فە.) سوورێر.

**شوورا:** شووره.

**شووره:** سنوور، پاسار، تخووب، دیوارێکی بەرز یا نزمە بە گردی شار و گۆڕستان و شووێنانی تردا دەکرێ بۆ دیارکردنی سنوور یا قایمی. ـ ی خانوو: کەنار. خراپ، نابار، ناباو، نەنگ.

**شوورەبی:** شۆرەبی.

**شوورەت** (باک.): بەدبەخت، چارەڕەش. (باک.) ڕووداو، ڕووشە، هەنگامە، قەوماو.

**شوورەومووره:** کەل و پەل، شڕەوبڕە.

**شوورەیی:** شەرم، نەنگ، چتی وا بۆ تۆ ـ یە: شەرمە، نەنگە.

**شوورتان** (باک.): خیگە، هیزە.

**شوورک** (باک.): خووار، خێچ، چەوت. (باک.) گۆڵەی دەرگا سا دار یا ئاسن بێ، بەو قفڵە ئاسنینانەش دەڵێن، کە وەکو گوڵ دەرک و پەنجەرەی پێ دادەخرێ. (باک.) دەستەندووی جووتی.

**شوورک:** (ڕۆژ.) لقەداری باریک و براو، شوو، شووڵک.

**شوورنگیف** (باک.): شیرەنگێو، زرنگ و وووریا لە شیر وەشاندنێدا، شیروەشێن. ـ ی: شیرەنگێوی، شیروەشێنی.

**شووریان** (ئەردە.): شۆر، شێوان.

**شووز:** (باک.) وورددەبەردی پارچەپارچەکراوی تیژن.

**شووزک** (باک.): وورددەبەرد.

**شووژن:** سووژن، گونووژ، (هەورا.) گۆچەوەنی، (دەر.) گوندووش.

**شووژن ئاژن:** سووژن ئاژن.

**شووژی** (باک.): ژوورژک.

**شووس** (هەورا.): سیی، سیپەلاک.

**شووس قلیم بیەی** (هەورا.): سیی ئەستوورەک.

**شووس ماسای:** (هەورا.) سی ئاوسان.

**شووش:** شیشەی زێوی داڕژراو، تەختەمزێوی داڕژراو. (هەورا.) سی، سیپەلاک. شیشە. لووس و ڕاست، ڕێک و پێک، لەبار و باریک و جووان.

**شووشە:** شیشە، جام، لە پەنجەرە دەگیرێ بۆ ڕووناکی و گەلێک جووره شووشەمراتی لێدروستدەکرێ. ـ ی مەی: قەرقەف. نێوی کچانە. ـ ی زێڕ یا زێو: شیشەی زێڕ یا زێو. (کە.) بەری گندۆرە وشووتی و کوولەکە، کە تازە پێدەگەن. (باک.) مەندیل، مێزەر.

**شووشەبەند:** شووێنێکە شووشەی زۆر لە دیوارەکانی دابێ. شووشەخانە: جام خانە.

**شووشەخانە:** جامخانە.

**شووشەکار:** کەسێکە، کە هەر شووشە لە پەنجەرە و پەرواز و چتی تر بگرێت. ـ ی: شووشەبەند، شووشەبەندی، خەریک بوون بەکاری شووشەوە.

**شووشەگەر:** کەسێکە شووشەی دروست بکات.

**شووشەیی:** چتی لووسی ڕاستی جووان.

**شووستەری کوردی:** جووره هەوایەکی گۆرانی کوردییە.

**شووش بەستن:** ماسوولکە بەستن لە دووای ئەوەی، کە ئازاری لێدانی گەیشتبێتێ.

**شووشتراو:** شۆڕاو.

**شووشتقان** (باک.): جلشۆر. ـ ی: جلشۆری.

**شووشتن:** شتن، شۆرین.

**شووشوو** (هەورا.) سیپەلک.

**شووشوویەهەر** (هەورا.) جەرگ و دڵ، جەرگ و هەناو، سیو جیگەر.

**شووش یەخ** (ئەردە.): ئەو شووشە سەهۆڵانەن، کە بە دار و شووێنانی بڵندەوە شۆڕدەبنەوە لەکاتی ساردی و سڕی.

**شووشێ:** ناوی ئافرەتانە.

**شووف** (باک.): شۆ، شێو.

**شووفا:** ـ کرن: شێوکردن، کێلان. ئێلێکی کوردە لە کوردستانی باکووردا.

**شووفک** (باک.): دەمەقاڵە. ـ ئێخستن: داخستنی دەرک و پەنجەرە.

**شووفاق** (مرک): دە ڕۆژەی ـ : دە ڕۆژەکانی سەرەتای بەهارییە.

**شووفلی:** نەخۆشیەکی یەکسمانە هەموو لەشی یا دەستەکانی تووک هەڵدەوەرێنی و کرێژی لێ پەیدادەبێ گۆرەوی لێدەخرێ تا خاوێن بێتەوە و خووێنی تێ دەتزێ و بنی خمی لێ دەدرێ تا چادەبێتەوە.

**شووفەلەت** (کە.): هەرزاڵ.

**شووک** (یەز.): شووڵک.

**شووکان:** شکراللە.

**شووکردن:** مێردکردن.

**شووگا** (ئەردە.): نێرەکێوی، کەڵەئاسک.

**شووگەره** (مرک.): ئاڵقەیێکە بە لغاوانەوە دەکەوێتە ژێر چەنەگەی یەکسمانەوە.

**شووڵ:** (شەم.) شووارک. شووڵک، تووڵ. لکەداری باریک و درێژی براوی دارەبی و ئیتر.

**شوول** (فە.): تیری سادە. (باد.) کار، فەرمان.

**شوولاق:** (گەرمێن) شەلاق، بە قامچی یا چتێکی شلک دەڵێن، کە پێی لێبدرێ.

**شوولاندن:** فیراندن.

**شووله** (کە.) ئەوەندە قورەیە، کە بە پێمەرە هەڵبگیرێ.

**شوولک** (باک.): شەرێ گچکە، دەمەقاڵە، قرتەقرت. شووڵک.

**شووڵک:** شوولک، شوو، شووڵ، شوولی گچکە، (خۆ.) شووار، شووارک، (هەورا.) تووڵ، بە لکە باریکەکانی دارەبی براو و ئیتر دەڵێن.

**شوولێ هەڵکێشان:** پێ لێ هەڵهێنان، پێ لێ هەڵبڕین، پێ لە بەرە تێپەڕاندن، تێ پەڕین، دەستدرێژی کردن، دەرچوونی مرۆڤە لە ئەندازەی خۆی لە هەموو کارێکیدا.

**شووم:** بەدفەڕ، (دەر.) بەستەک، بەدوودم، دژبڕ، دوومۆر، سەرەخۆرە، بێوڵەت، بێوەڵەت، قەشان، سەرشین، قەشقە، نەها، (باک.) بەتار، بزۆز، قەش، کەرانی، ناپیرۆز، بێ فەڕ.

**شوومردگ:** مێرد مردوو.

**شوومی:** دژبڕی، دوومۆری، بێولەتی.

**شوون:** (هەو.، باک.) شووێن. (باک.) دووا، پاش، بارام کەسی بە ـــ ی خۆیەوە نەهێشت.

**شوونەوار:** شووێنەوار.

**شووندەرزی** (باک.): شووێندەرزی.

**شوونک** (باک.): (هەو.، شەوا.، ساڵە.) کوتکی جلشوشتنییە، گەلاکوتک.

**شوون نیان:** شوێن پێ هەڵگرتن، بە دوادا کەوتن.[*]

**شوونوار** (باک.): هەوار.

**شوونیان:** بڕوانە: شوون نیان.[*]

**شووهان** (فە.): شووان.

**شووهۆڕ** (ئەردە.) شوولی تەڕ.

**شووێڵ** (ئەردە.): زەوی باریک، پارچەزەوییەک.

**شووێم** (ڕۆژ.): شۆ، شۆو.

**شووێن:** (چی.) کەرخ، شۆپ، (باک.) پەرتال، تانی. جێگەه، جەه، جێ، دەر، جەخەر، پڕتووک، شووێنەوار. چخز، چخیزەک، کەرخ، شوورن، دەوس. بەپێ و ـــ کەوتن: وەشووێن کەوتن، وەدووکەوتن، لێ پێچانەوە، پێوەچوون، لێ گەڕان، تۆژانەوە. بێ ـــ : بێ سەروشووێن، بێ کەرخ، وون، بزر، گوم، (باک.) بێ وار. بێ منداڵ، وەجاخ کوێر، بێ دووایی. وە ـــ کەوتن: وەدووکەوتن، پەی بردن، شووێن هەڵگرتن.

**شووێنەزا:** ئەو شووێنەیە، کە مرۆی تێدا لە دایک بووبێ.

**شووێنە گومەگێ:** شووێنە وونێ.

**شووێنەوار:** کەرخ، شوونەوار. ـــ ی لێ نەهێشتن: کەر میزی بڕین، کێر میزی لێ بڕین.

**شووێنەوونکە:** شووێنەوونێ. سەرشێواندن لە کەسێک بەکردار یا بە ووتە بۆ شاردنەوەی کارێک لەوی.

**شووێنەووني:** شووێنەوونێ، شوێنەوونکە.

**شووێنەوونێ:** شووێنەوونکە.

**شووێن بە شووێن:** دووابەدووا.

**شووێن خستن:** ناردنی کەسێک بە شووێن یەکێکی تردا بۆ ئاگاداری لە کاروباری.

**شووێنک** (باد.): گەلاکوتک.

**شووێن کەفتن:** دوواکەوتن.

**شووێن کەوتن:** شووێن کەفتن.

**شووێن کەوتوو:** دوواکەوتوو.

**شووێن کردن:** کەرخ بەجێهێشتن لە ئەندامدا بەهۆی تەسکی و پەستی و تەنگییەوە: ئەنگوستیلەکە ئەوەندە گچکەیە شووێنی کردۆتەوە.

**شووێنکردنەوە:** جێ کردنەوە، ڕێگادان.

**شووێنکۆمەکێ:** شووێنە وونی.

**شووێن کردنەوە:** جێ کردنەوە.[*]

**شووێنگر:** جێگر، شرەگر.

**شووێنگرتن:** جێ گرتنەوە.

**شووێن هەڵگر:** شۆپاژۆ، شۆپگەڕین.

**شووێن هەڵگرتن:** دۆزینەوەی چتی دزراو بە هۆی شووێنی پێوە لە زەوی.

**شوویت:** گیایەکی گەڵاووردی تام و بۆن خۆشە دەکرێتە چێشتی دۆڵمە و دۆ و ماستاو و تۆراخەوە، دەستچێنە، شیووت، (هەورا.) چوویت، (ڕەوا.) دۆراخ.

**شهار** (باک.): کۆمای تاتەبەردان.

**شهاندن:** (هەر.) زەڕەی کەر و ئێسترێیە، زەڕاندن.

**شهوور** (باک.): شهین.

**شهێن:** حیلەی ئەسپییە.

**شهی** (لو.): نزگەرە.

**شهین** (باک.): حیلاندن (حیلەی وولاخی بەرزەیە). (باک.) هاشەی بایە یا ئاو. (باک.) شەهێنی تەرازوو.

**شێ:** شیی، لێک جووێ کراوەوە، فشوفۆڵ. لۆکە و خوری ـــ کراوە: فش و بڵاوکراوەوە. نم، تەڕایی، تەڕی، شەکرەکە. ـــ ی کێشاوە، شێداره: ئەداره. لە باکوور بە ڕەنگی سوور و ڕەش دەڵێن، ڕەنگێکی سوورە بە زەردی بڕوانێ، بە سوورێکی سپی پاتیش دەڵێن، کە تەنها بۆ وولاخی بەرزە دەستدەدات. (باک.) موو زەرد.

**شێب و عەریان:** دوو گوندی مەزنن و ناودارن لە نزیک شاری ماردینێدا.

**شێبێ:** گوندێکی کوردانە لەناو (هەڤێرکا) دا خەڵکی ئەو گوندە لە (١٩٢٧) دا چوونە سووریە گوندێکیان بەو ناوە ئاواکردەوە، بەڵام کاتێکی گەڕانەوە خاکی خۆیان گوندەکەیان کەوتە دەست مرۆڤێکی نارەو.

**شێپ** (باک.): گەلییەکی تەنگە لەنێو نێلی (ڕەما) ن دایە، ئەمڕۆ نەفت و گازی لێ دەردەخەن.

**شێل** (باک.): سەرنزم.

**شێپوور:** بۆڕی سێدەنگ، شەیپوور.

**شێپێو:** چتێکە ئەندازەی شێ و نمی نیشاندەدات.

**شێت:** جندار، جنۆکەدار، دێوانە، (باک.) دین، ناپتەر، پەتیارە، لیوە، هار، (ئەردە.) هەردە، دێری، لێویاک، لێهاتک.

**شێتاری:** سوورێکی تۆخە بۆ وولاخی بەرزە بەکاردەبرێ.

**شێتانە:** کردار و ناکارێکە وەهی شێتان بچێ.

**شێتە پەتەڕی:** شێت و وێت.

**شێتەوژیرە:** کەسێکە هەردەمەی لەسەر هەوەسێک بێ.

**شێت بوون:** دین بوون، تێکچوونی مێشکی مەردووم و نەمانی ژیری و هۆشی.

**شێتخانە:** دینخانە، دێوانەخانە.

**شێتکە:** شێتۆکە.

**شێتگیر:** شێلگیر، شێرگیر، چاکە لەگەڵ ناکەسان بکرێ ـــ دەبێ، کەسێکە چیرە بووبێ یا هاندرابێ لەسەر کردنی چتێک.

**شێتۆ** (هەمر.): هۆی شێتە لەکاتی بانگ کردنی شێت و گێلانەدا بەکاردەبرێ.

**شێتۆکە:** شێتێکی ناوونجییە.

**شێت و شڕ:** پەتیارە.

**شێت و وێت:** شێت و شڕ و بەرەڵا.

**شێتی:** دێوانەیی، هاری، دینی، (باک.) ئاپتەری، لێوە، لێهاتن.

**شێتێتی:** دینێتی، دێوانەیێتی.

**شێخ:** خواپەرست، پێشەوای ئایین، کەسێکە لە زمانی ئارەبیدا، کە زانا بێ.

**شێخانە:** جوورە هەڵپەڕکێیەکە.

**شێخانی:** جوورە هەڵپەڕینێکی کوردییە. خێڵێکی کوردە لە هەرێمی کەرکووکێدا دادەنیشن.

**شێخەڵ** (شا.): شەغەڵ، دارودرەختێکە، کە هەڵپاچرابێ بۆ بەرزبوونەوەی.

**شێخەڵکردن:** هەڵپاچینی دارودرەختە بۆ بالاکردن.

**شێخەوەتی:** خێڵێکی کوردە لە کەنار هەولێرێ دادەنیشن.

**شێخ بوزەینی:** هۆزێکی کوردە لە کەناری کەرکووکێ.

**شێدار:** غەدار. ـــ ی: غەداری.

**شێر:** دڕندەیێکی بەناوبانگە و بە پادشای هەموو جانەوەران لە پێنووس دراوە سەرووشان و ملی زل ولای خووارەوەی پووت و گچکەیە. (شەم.) فێر. ـــ کرن: فێرکردن. شیر، شمشیر(تیغ). نێوی یەکێکییە لە دووازدە بورجەکانی ئاسمانێ. ئازا، دلێر، دڵقایم، بە جەرگ، زاڵ، چێرە، ڕژد، شێرگیر. (باک.) شەڕ، جەنگ.

**شێرازی:** شیرازەی کتێب.

**شێران:** (ئەردە.) شێروخەت. جوورە قومارێکە بە پووڵی دەکرێت.

**شێرانە:** وەکوو شێری، کردارێکی ئازایانەیە، کە لە کردەوەی شێری بچێ.

**شێرە** (ئەردە.): کورتەی (شێخ محەمەد) یە. شرە. (هەو.) ئەیرۆ، ئەی شێرە: وەیرۆ.

**شێرە بەفرینە:** شێرێکە لە بەفر دروست دەکرێ لەلایەن منداڵانەوە.

**شێرەت** (باک.): ئامۆژگاری، پەند.

**شێرەزدین:** شێری خودا، میری بۆتانی بووە لە شەڕی بەدرخان پاشادا بوو بە دوژمنی مامی خۆی دۆستی دوژمنان.

**شێرەکولە:** شێرەکوللە.

**شێرەکوللە:** جوورە کوللەیێکی زۆر گەورەیە نافڕێ و بێ باڵە.

**شێرەکی:** جلی ئەسپە، کە لە مافوورە دروست کرابێ بۆ جووانی.

**شێرەوان:** کەسێکە شێری بەخێو دەکات.

**شێرەوانی:** پیشەی بە خێوکردنی شێر. *

**شێرباز** (باک.): بێ باک، بێ پەروا.

**شێرپەنج:** شێرپەنجە.

**شێرپەنجە:** سەرەتان، شێرپەنج، برین و دەردێکی پیسە چارسەری گرانە.

**شێرپەنج:** (موک.) چنگەنە، کەرەجنە، وەکو جاڵجاڵۆکەی وایە، بەڵاَن زۆر گەورەترە.

**شێرجەنگ:** نێوی پیاوانە.

**شێرداخ:** جوورە پارچەیەکی ئاوریشمییە لە شام دروستدەکرێ.

**شێردەم:** (ئەردە.) شیرەی ئاوێ.

**شێردڵ:** دڵقایم، ئازا، بەجەرگ، نێوی نێرینانیشە. ـــ ی: ئازایی، دڵقایی.

**شێرزاد:** نێوی نێرینانە.

**شێرک** (باد.): دەستەندوو.

**شێرکۆ:** نێوی نێرینانە، بەچکەشێر. شێری چیا. شێرکۆ ئەسەدوددینی کوڕی شادی کوڕی مەڕوان مامی سەلاحەددینی کوڕی ئەییووب ـــ نە جەموددینی کوڕی شادی کوڕی مەڕوان.

**شێرکۆڵ:** (ئەردە.) دارێکە چوار پاڵووە لە ژێر کوڵەکەدا دادەنرێ. بێچووە شێر.

**شێرکۆڵە** (ئەردە.): شێرکۆڵ.

**شێرکوژ:** نێوی نێرینانە. مرۆی ئازا و بەجەرگ. نێوی گردێکیشە.

**شێرگەل:** (باک.) شێری گەل، کەڵەشێر.

**شێرگیر:** خۆلێ گۆڕاو، بەدەمەوەدراو، ڕژد، ترسشکاو، زاڵ. (هەورا.) شێتگیر. سەرخۆش، نیوەمەست، مەست. ـــ ی: خۆلێ گۆڕان.

**شێرمەس:** شێری مەست، سەرخۆش، نیوە مەست.

**شێروان:** ناوی دەربەگێکی کوردە لە ژووررووی بۆتان و بەختادا.

**شێروانی:** دارەڕای دووقەدە لەسەریەک ڕایەڵ دەکرێ.

**شێرۆ:** نێوی نێرینانە، کوڕی خوسرەوی پەروێزی بووە.

**شێرۆکە** (هەو.): ئاسنێکی پانە لەنێو کەرستەی جووتیدایە.

**شێروخەت:** جوورە قومارێکە بە دراو دەکرێ.

**شێروخەتانی:** جوورە گەمەیەکی قوماری منداڵانەیە.

**شێروگورگە:** چەند دارێکە لە هەر چوارلاوە دەدرێتە بەرکوڵەکە یا بەر پێی ئاش تا باش دامەزرێ و نەبزووێ.

**شێر یا خەت:** شێروخەت، قومارێکە بە پووڵی دەکرێ.

**شێرین** (باک.): شیرین، پەسند.

**شێز:** شێس، زیندەوارێکی وورد و گچکە و گەڕیدە وورییایە لەنار گەڵ و لەشی ووڵاخ و ماڵاتاندا دەبێ، مێشە سەگانە.

**شێس:** بڕوانە شێست. شێز.

**شێست:** شەست، (٣) جار بیست، (٦) جاردەیە.

**شێستە بارانە:** ڕەهێڵ، شەستە بارانە، ڕەهێر، ڕێژنە بارانە. شەست دەکا.

**شێستەم:** شەستەم.

**شێستەمین:** ژمارەیەکە شێستی تەواو دەکات.

**شێست پەڕ:** شەست پەڕ، گوڵێکی بۆنخۆشە، نێرگسی جۆری گوڵێکی تۆیی زەردی بۆنخۆشە وەکو گوڵە جۆری وایە، بەڵام گەورەترە. گوڵباخ.

**شێست تیر:** شەستیر، گوڵلەپژێن.

**شێف:** (کر.) هێڵەبڕکێ. شیار. زەوییەکە بە یەک گاسن کێڵرابێ.

**شێفەلەتە:** بەری گیای (مارگر) ییە، کە سوور و شین و خۆشە و دەم دەداتەوە.

**شێفبڕین:** کێلانی زەوی بەگاسنێکی، وەرد بڕین.

**شێفتە:** (ئەردە.) شەیدا، حەسپەن.

**شێفدانەوە:** شێفبڕین.

**شێفل:** کشت وکاڵێکی کەم.

**شێفیار:** (ئەردە.): جووتیار.

**شێڤ:** (باک.) شێو، نانی ئێواری. شەو.

**شێڤدەست** (باک.): (باک.) شەڤدەست. داو و تەڵەی کەوێیە.

**شێڤی** (باک.): شەوانە، هی شەوێ.

**شێڤین** (باک.): شەڤین.

**شێکە:** بڕوانە: شیکە.

**شێکر:** شەکر.

**شێگۆ:** نێڵێکی مەزنی کوردە کەوتوونەتە لاتی چیای ساسوونێ.

**شێڵ:** پێخووێ یەک تور، تاوێرێک. هەویر، کە بە نۆرەیەک بشێلرێ. مرازێکە لە دووای هەر ناوێکییەوە بێ دەیکاتە بکەر وەکو هەویرشێل، قوڕشێل. بار.

**شێلاقە:** گیایەکە.

**شێلاڵقە:** باڵندەیەکە، شەلاقە.

**شێلاقە:** مەزرەقە، مەزرەق.

**شێلان:** (هەورا.) شێلای، هەڵشێلان، داشێلان، لەش شێلان بە دەست یا لاق بە چتێک دانان بە قایی بۆ ئارام کردنی ئێش و ژانی لەش. قوڕشێلان. زگ ـــ: تووشی ئەرک و ئازارکردن. بەلاقی ـــ: دەوساندن، پێ پەستکردن.

**شێلانە** (هەورا.): قەیسی.

**شێلاندن** (باک.): ڕووتکردن. چین و قەد کردن. شێلان.

**شێلانن:** شێلاندن. کوتان، پاکوت.

**شێلانێ** (هەورا.): قەیسی.

**شێلاوکە:** شێلارگ.

**شێلاوگە:** تەرپیەکی زۆرە، کە چتێک دایدابێ، بارەترپیەکە ـــ ی لێ هەڵنیشتووە لەکاتێکیدا، کە بەسەریەکدا تەپیبێ و ئاوی لێ بچۆڕێتەوە.

**شێلای** (هەورا.): شێلان.

**شێلە:** جوورە تەنراوێکی گوڵداری دەزووی تێکهەڵکێشراوە وەک جامانە، ژنان دەیکەنە پۆشاک.

**شێلەوبێلە:** واو وا، ناوا و ئەناوا.

**شێلران:** بەلاقی ـــ. شێلانی کەسێک بە پێیان.

**شێلک** (بار.): (بار.) ڕیتک، جوورە نانێکی تەنکە لە دەخڵی تاڵەو هەرزن و جۆی دروست دەکرێ و بە شێلی دەخرێتە سەر سێڵی و سوور دەکرێتەوە. (هەورا.) شێلینگ، دەستڕێژ. (باد.) هێرش، پەلامار.

**شێلگ:** دەستڕێژی تفەنگ.

**شێلگیر:** کەو. جوورە بێژنگێکە کونی لە بێژنگی گەورەترە.

**شێلنگ:** (هەورا.) شێلک. دەستڕێژی چەکان. تپێن، قڵپ و قۆپ.

**شێلم:** (باک.) تێشوو، مەخمەلات. (هەورا.) شەلەم، شەلەمە، شەلمی. گیایەکی پاییزەی گەڵاپانە بنکێکی خڕی سپی هەیە دەخورێ.

**شێلمە:** (دەر.) شەلمە. گیایەکی تاڵە لە نێو جۆیدا شین دەبێ و زیانی پێدەگەیەنێ.

**شێلم بە ترش:** جوورە ترشیاتێکە لە گێزەر و شێلم دەگیرێتەوە.

**شێلم شاترە:** (خۆ.) گیایەکە وەکو تۆڵەکە لەگەڵ ساواری لێدەنرێ. (جا.) شێلک. ڕەنگە شاتەرە بێ.

**شێلمۆک** (باک.): پەنیری کوڵاو.

**شێلمۆکە:** (دەر.) شەلمە. شەڵوار بەکۆڵ، چڵە گیایەکە بستێک بڵند و گەڵایەکانیشی وەهی خوژیلکی دەچن، کە پەلکی لێ کرێتەوە شیری لێدێ، گوڵی شینی خڕ دەدا بنی وەکو شێلمییە بنی بەشی هەشت کسانە بۆ ڕەوانی دووایە دۆ و ئاوی سارد بخوا.

**شێلوو** (باک.): ڕووت، قووت، کوت. (هەورا.) شێلوی، شلوێ، لیڵ.

**شێلوێ:** ئاوی شێلوو، شێلۆ، شیلی.

**شێلهان** (باک.): خوشین و خزینی مارییە.

**شێلی** (باک.): ئالۆز، شلووێ.

**شێلینگ:** شێلنگ، ڕێژن، دەستڕێژی تفەنگ و تۆپان. (جا.) شێلک.

**شێمی** (باد.): تووره سوورە.

**شێن:** توانین. (باک.) جووان، بەرەونەق، ڕەونەقدار، بە بەرووبۆ. ـــ کرن: کشت و کاڵ ڕەنێوهێنان.

**شێناهی** (باک.): شینی.

**شێنە:** ئارام، هێدی، کاوەخۆ. دەرفەت. ـــ یی: ئارامی، هێوەرە، هێدی، کاوەخۆ. بە ـــ: لەسەرەخۆ.

**شێنەیی:** شێنەیی، هێواشی، لەسەرەخۆیی.

**شینکە:** زەوی کرێنی شینکار. جوورە تفەنگێکیشە لە دەمەوە دادەگیرێ. ناوی تیرەیەکی کوردە لە ناوچەی شارباژێڕ.

**شینکەیی:** شینەیی.

**شێنی** (باک.): مەزرا، زەوی کشتوکاڵ لێکراو. (باک.) داڵدە، نیشتنگا، ئاوەدان. مەزن. (باک.) ئافرەت بە دۆستی خۆی دەڵێ شێنی: یار. کوڕیش بە دۆستی خۆی دەڵێ شێنا: یار.

**شێو:** شۆ، وەرد، شووف، شێڤ، هێڵەبڕکێ. (کە، هەو.) شەرم. بە ـــ: بەشەرم، پەردەنشین. شیو، دۆڵ، دەرە. چێشت، (هەورا.) چاشتی. خۆراکی شەوی (لای ئێواران) خواردەمەنیەکە لە ئێوارانـدا بخورێ، جەمی ئێوارێ. ئێوارە. حوققە، کەڵەک، فەن.

**شێوارە:** سەربزێو، یاخی.

**شێواز:** شێوە. سەلاری. شەرم، پەردەنشین (ئەدەب). بە ـــ: بە ئەدەب. بێ ـــ: بێ تۆزە، ترۆ، سەرسەری، هیچ و پووچ، خووێڕی، جینگەنە، بێ شەرم.

شێوازی: بێ ـــ: بێ تۆرەیی، بێ ڕەوشتی.*

شێوان: تێکچوون، پەشێوان، ئاژاوە، شڵەژان، قـەخووین، لـۆس بـە لـۆس، تێکدران. کاتی ڕۆژاوایە، بانگی شێوان: بانگێکـە دوای ئـاوابوونی ڕۆژ لـە کوردستان مـەلا بـانـگ دەدا. تێکچوونـی چـت، خوواسـمرت لـێ نەشێوێنێ.

شێواندن: تێکدان، پەشـێواندن، پەشـۆکاندن، ئـاژاوەکردن، تـەڕتلاندن، شڵەژاندن.

شێوانن: شێواندن. شڵەقاندن، ئاوێتەکردن.

شێوو: پەنزەهار، چەواشە، سەرلێ تێکچوو، پەشۆکاو، شپرزە، پەشێواو، تێکچوو. ئاڵۆز، نـارێک. ـــ ی: شلووقی، خرسجر، پشێوی، سەختی، سەخڵەتی، ئاژاوە، ئاشەف، ئاشـەڤ، پەشۆکاوی، پەشێواوی، شپرزەیی، تەنگانە، تەنگی، تەنگ و چەڵـەمەیی.

شێوانی کاروبار: شەپۆیان.

شێوە: ئازین، (باک.) جەلەب. جوور، چەشن، ڕەوروشت. بەو ـــ یە: ئـاوا، بەو جوورە، بەو چەشنە، ئـەناوا. ڕێگە، یاسا. دیمەن، دیدار، ڕووالـەت. نیشانە. وێنە.

شێوەباز: کەڵەکباز. ـــ ی: کەڵەکبازی.

شێوەخووار: شـەولـەوەڕ، لـەوەڕاندنی مالاَتانە تا کاتژمێرێک لـە شـەوێ دەچێ.

شێوەران (موک.): گیایەکە بە کولاَوی لە چاوی چخمەدار دەکرێ.

شێوەڕەش: چێشتی ماشێنە.

شێوەرد: شۆ، زەوی کێڵراو.

شێوەقولاَنی: شیوشیوانێ، چێشتە قوڵەی منداڵانە.

شێوەقوڵە: چێشتەقوڵەی منداڵان.

شێوەکردن: ناسینی چت بەهۆی شێوەوە.

شێوەنما: سینەما.

شێوکار: ئاشچی، شێولێنەر.

شێوکەر: شیوکار، شیولێنەر.*

شێوکردن: چێشت لێنان. نانی ئێوارە خووارادن.

شێوگۆڕ: گەرمەگۆڕ.

شێوور: گوندێکە کەوتۆتە خووارووی قامیشلوو.

شێویاگ (ئەردە.): شێواو، ئاوێتە، پەرێشان.

شێویان (ئەردە.): شێوان.

شێ: شێ، فش. چتی چنراو ـــ دەبێتـەوە: واتـە سفتیەکەی لێک بـلاَو دەبێ. ـــ بوونەوە: شێ بوونەوە. (هـەورا.) چوو، ڕۆیشت. (فـە.) مێرد، شوو.

شیار: (باک.) ووریا، ووشیار. زەوی کێڵراو، وەرد، شێو، شێڤ.

شیارە (باد.): کایەکە لەبنی چالاَن دەکرێ تا دەخڵەکە نم نەکێشێ.

شیاربوون (باک.): ووشیاربوون.

شیاربوونەوە: ووشیاربوونەوە.

شیارکرن: ووشیارکردن.

شیارۆک (باک.): مەشکە، خیگەی شیرییە.

شیاری (باک.): هۆشیاری.

شیاق (کە.) جوورە قوماشێکی تەنکە گەلێ ڕەنگی هەیە.

شیاکە: گـارنـگ، تـڵ، سـەنێر. (هـەورا.) ڕیتاڵـە. ڕیخ، پیسایی ڕەشە وولاَخ.

شیان: دروست بوون، پێ شان، ڕەوابـوون، لێ دروست بـوون. شایان، شایستەبوون. گونجان.

شیاندن (زا.): ڕەوانەکردن.

شیانن: شایان کردن، دروستکردن، چاک کردنەوە.

شیو (هەورا.): سەلیقەدار، شایان. گونجاو، ڕەوا. ـــ ی: سـەلیقەداری، شایانی.

شیایین (باد.): تۆپین.

شیەی (هەورا.): چوون، ڕۆیشتن.

شیپ: لیسـپی قۆچـەقانی و قـامچی، ڕیشـووەکانیانە. (بـاک.) پـرژ، تاڤگە، خووڕاو.

شیپان: نێوی هەریەک لە چووار پارچەکانی چووارچێوەیە.

شیپانە (باک.): لاشیپان: ناستانە، جێگـای کـەوش لێ داکـەنادنێ. (باک.) شیپک.

شیپە: شیپ. پانایی، بەرینی. (کە.) لاسکی قۆچەقانییە، کە بەدەست دەگیرێ و ڕیشووەکانی وی و قامچی.

شـیپرە: (بـاد.) پارچـە زەوییەکـە گیـای هـەڵزی لێ شـین بووبـێ، کـە گیایەکەیان درووەوە پێی دەڵێن دورینگە.

شیپ شیپکردن: پارچەپارچەکردن.

شیپک (باک.): ناستانە، ژێر دەرگا.

شیپۆڕان: (ئەردە.) شەڕ، بەربەرەکانی، شیپ و هۆڕ. دادوبێداد.

شیپوهۆڕ: شیپۆڕان.

شیتاڵ: بروانە: ڕندۆڵ.

شیتاڵشیتاڵ: ڕیندۆڵ ڕیندۆڵ، پارچەپارچە.

شیتان (ئەردە.): زەوی نەرمان و بێ بەرد، (ئەردە.) ئاران.

شیتانن (ئەردە.): شاتاندن، قیژاندن، شریخانن، چیخانن.

شیت: فیتوو، زرنگ، وریا.*

شیتە: قیژە، چریکە، شریخە.

شیتەشیت: قیژەقیژ، حیچە، شیحە، شریخەشریخ، حیچەحیچ، شیپۆڕان.

شیتک: پشتێند.

شیتلۆک (باک.): کیتەڵە.

شیحە (ئەردە.): قیژە، چریکە، شریخە.

شیخر (باک.): تیژ (بۆ تیغ و دەرزی).

شید: گڕی ئاوری، ڕووناکی ئاگری.

شیدان (ئاوێ.): شەیتان.

شیدایەزەکی (زەن.): شەیتان پەرست.

شیڕ: ترهـا: ـــ لـە پیاوەتیت: شیرها لـە پیاوەتیت. دەنگی دڕانی کەر و پارچەیە.

**شیر:** (هەورا.) شۆت، چتێکی سپی و شلە لە مەمک و گوانی مێیینەی زاو دێتە دەرێ. ___ بەرژۆ: لە شیرێژی ووشک کراوەوەیە بەبێ ئەوەی، کە بکوشرێ و بکرێتە سەلک. لە شیر ئەمانە دروست دەکرێن: ماست، سەرتووی، دۆ، ماستاو، پەنیر، شیرێژ، سەرتووێ، قەیماغ، لۆرک، کەرە، رۆنی زەنگ، دەڵمە، دانەدۆک. شمشیر، (باک.) شوور، تیغێکی درێژ و پانە لەناو کالان دەنرێ. (لو.) شێر. لە ___ کردنەوە: ژشیرڤەکرن. ___ ی کۆن: گۆرت.

**شیرا:** ئاژاڵی شیردار و شیردەر، ئاژاڵ و ماڵاتێکە شیربدات.

**شیراج** (کە.) شیرێژی تەڕ.

**شیراز:** شیرازە.

**شیرازە:** (باک.) برۆش. هۆنینەوە. ___ ی پەرتووکان: چنینی کەنارەکانی لای بنەوە بۆ قایمی. ___ ی کەلاش: کەنار چنین و جزوو بەندکردن. چزووبەند.

**شیرازەبەن:** شیرازەبەند.

**شیرازەبەند:** کەسێکە شیرازەی پەرتووکان دەکات. چتێکە شیرازەکرابێ.

**شیرازی:** (بابا.) جوورە ترێیەکە.

**شیراژ:** شیرێژ.

**شیران:** قیژان، گوڕڕە.

**شیراندن:** دەنگ بەرزکردن، نەڕاندن، گوڕاندن بە توندی.

**شیرانی:** (باک.) شیرینیات، شیرینی، (باک.) شیرانۆک. (باک.) شیرینی ژنهێنان.

**شیرە:** چەند ددانێکی شیرییە لە زاری ڕەشە وولاخی و یەکسماندا لە تەمەنی دوو ساڵ و نیویدا دەکەون دوواییە ناوێژەی دەردەکات، کە ئەویش کەوت بەرازەی دەردەکات لە تەمەنی شەش ساڵیدا. شیلە، مەی، غمی چتی شیرین. ڕینک، ڕینگاڵ. ڕۆنگەرچەک. ئاوی ترێیەکیە، کە بۆ دۆشاوی بێ پێش ئەوەی بیکوڵێنی و هەوێنی تێکەن ___ ی پێدەڵێن. ئاوێکی ڕەشە درەختان دەری دەکەن.

**شیڕە:** قیڕە، قیژە. جیڕە وەکو دەنگی دادڕینی بلووری و چتی تر. نەڕڕە.

**شیڕەشیڕ:** شیڕەی یەک لە دووای یەکتری، شیڕوهۆڕ.

**شیرەبەرەوو:** لقی تەڕی دارە بەرروویە.

**شیرەپەپە:** مرازێکە لە کەرستەی جووتی. ئێرەق.

**شیرەپەزخانە:** دوو کانێکە ڕۆنگەر چەکی تێدا ڕەنیو دەهێنرێ.

**شیرەت:** شەرفرۆش، قولتووشی، بێ شەرمی، زماندرێژی، توند، بەدخوو، ئالۆز. (باد.) ئامۆژگاری.

**شیرەتین:** شیرتێن، شرتین، شیرەوگەرم، شلەتین، شیلەتین، چتێکە وەکو شیری تازە دۆشراو گەرم بێ.

**شیرەجۆ:** جۆشیرە.

**شیرەچرا:** ڕونی چرا.

**شیرەخانە:** مەیخانە.

**شیرەخۆورە:** منداڵی شیرەخۆرەی بەرمەمکان، بەبە، بەبەڵە، شیرمژ، ساوا.

**شیرەخوشیلک:** شیرخۆژیلک. گیایەکی بەهاری شیردارە جوورە گوڵێکی دەگری، شیرەکەی بۆ ڕەوانی زۆرباشە.

**شیرەدان:** دەفرێکە ڕۆنگەر چەکی تێدەکرێ بۆ سووتاندن. دیزەیێکە ڕۆنگەرچەکییە، کە لە زەویدا دەشارنەوە.

**شیرەزە:** ژنێکە منداڵی لە شیر بکاتەوە ئەوسا ئاووس بێ.

**شیرەسوڵتانی:** شیلە سوڵتانی، جوورە ترێیەکی ڕەشە گلووی خڕ و گەورەیە و دەنکیشی هەیە.

**شیرەشیر:** گاڵەگاڵ، بە شیرەی منداڵ یا ژن و پیاوی بێ شەرم دەڵێن.

**شیرەکێش:** شیرەچی.

**شیرەماڵ:** دانەوێڵەیەکە دووای خەرمان هەڵگرتن بە دەست کۆبکرێتەوە لە جێگای خەرمانەکە یا بە بێل و گسک.

**شیرەوا** (هەورا.): شیربرنج، شۆرباوی ساواری.

**شیرەوانە:** (کۆ.) سەوەشیر. تریانە، تەهریان. ژلیان.

**شیرەوگەرم:** گەرم و سارد، شیلە و گەرم، شیرتێن. تین، شیرگەرم.

**شیرەوگەرمی:** تینی.

**شیرەی خاشخاش:** تریاک.

**شیربایی:** دراوێکی لاوەیە بە ناوی ___ یتی لە زاوا دەستێنرێ بۆ کەس و کاری بووک.

**شیربرا:** برای شیری.

**شیربرنج:** شیربا، (هەو.) برنج بە شیر، (هەورا.) شۆتینە، چێشتێکە لە شیر و برنج دروستدەکرێ.

**شیربۆدان:** مەبەس لەوەیە، کە یەکێک کەڵکی بۆ یەکێکی تر ببێ.

**شیرپارزۆنک** (باک.): شیرپالوو، شیرپالێو.

**شیرپاک:** بریتییە لەمەردومی دڵ و داوێن پاک. ___ ی: مەبەس لە دەست و دڵ و داوێن پاکی.

**شیرپالۆک:** شیرپالێو، پالوێنە، (باک.) پارزۆنک. کونێکە دەهێڵرێتەوە لە تەنیشت (نێ) بۆ ڕایی کردنی گیروگرفت.

**شیرپالوو:** پالووێنە، شیرپارزۆنک.

**شیرپالێو:** پالووێنە، شۆپ پەرزن، شیرپالێووک، پەرۆ یا بووزوو یا دەفرێکی کونکونە شیری پێ دەپالێوون.

**شیرتێن:** شیرەوگەرم، شیرتێن، نیوە گەرم.

**شیرتین:** شیرەوگەرم، شلەتێن، شیلەتێن، چتێکە لە گەرمی و ساردی وەکو شیری تازە دۆشراو وابێ.

**شیرخەس:** گیاندارێکە لەکاتی شیرەخۆرەییدا خەسێنرابێ.

**شیرخشت:** چتێکە فێنکی سپیە لەگەڵ شیری دەدرێ بە منداڵان بۆ دامرکاندنی گڕی دەروونی. جیوەیێکی ناسراوە.

**شیرخوواردن:** شیرمژین.

**شیرخۆژیلک:** گیایەکی بەهارییە و شیردارە جوورە گوڵێک دەگرێ و شیرەکەی زۆر ڕەوانە.

**شیرخوشک:** خوشکی شیری.

**شیرخوواردن:** مژینی شیر، خوواردنی شیر.

**شیردارخ** (ئەردە.): پارچە ئاوریشمێکی ناسراوە.

**شیردار:** گیانداری بە شیر.

**شیردان** (هەورا.): شیلاوروک. مەمک، گووان، شووشە و چتێکە شیری تێکرێ. شیردان بە ساوا. کالان.

**شیردەر:** مێیینەیەکە شیر بدات بە بێچووەکەی. شیرا، شیردار.

**شیرشەمشەڵە:** شیری چەکچەکیلەی.

**شیرشـــیر** (بـــاک.): جیکـــەجیک و جوکـــەجوکی بـــاڵندان و جوجیلەکانیانە.

**شیرێژۆکە:** خوژیلک.

**شیرقان:** شریقە.

**شیرقاندن:** شریقەکردن.

**شیرقە** (کە.): شریقە، گرمە، بڵمە.

**شیرک:** گیایەکە.

**شیرکتک:** ئەو شیرەیە، کە لە زگی کاریلە و بەرخیدایە دووای سەربڕانی شیرەکەی دەردەخەن بۆ هەوێنی پەنیری.

**شیرکرۆژ:** شیرکوورژ، ئازا.

**شیرکوت:** کوتانی دانەوێڵەیە لەکاتی ڕەق بوونی شیرەدا بۆ بەرکوت.

**شیرکوتک:** قوژیلک.

**شیرکوڵ:** ژێرکوڵ، دارێکە چوار پاڵوو دەخرێتە ژێر کوڵەکە.

**شیرکوروژ:** شیرکرۆژ.

**شیرکێشان:** مەبەس لە خۆئامادەکردنە بۆ تێوەچوونی شەڕ، فیسارەکەس بەرانبەر بە دوژمن شیری کێشا.

**شیرگەر:** کەسێکە شیر و خەنجەری دروست بکات.

**شیرگەرم:** شیرەوگەرم.

**شیرگەری:** پیشەی شمشێرسازی و خونجەرسازی.

**شیرگەلە** (باک.): ژیرکەڵە.

**شیرگورگە:** چەندداریکن لە هەر چوارلاوە دەدرێتە بەر کوڵەکەی(نیێ) ی ئاش بۆ ئەوەی تا دادەمەزرێ و جێگا بگرێ.

**شیرمایی** (ئەردە.): شفرەی ددانی فیلی.

**شیرمەشکە:** (ڕەوا.، هـەو.، کۆچـەر) مەشـکەیەکە بێریـان لـە بـێرێ وە شیری تێدا دەهێننەوە مالان یا هۆبان.

**شیرمردە** (هەورا.): لاواز، کز، بێچوو و فەرخەیێکە لەبەر بێشیری دایکی زۆر لاواز بێ.

**شیرمز:** شیرەخۆرە، ساوا.

**شیرمژە:** گیایەکە گوڵی شین دەردەکات، منداڵان گوڵەکان هەڵدەکێشن و دەیژن شیری لێ دێ.

**شیرمقاق:** گیایەکی پەلک باریک و شینە گوڵیشی سپیە و تامکێک بڵند دەبێ و بە پاک کراوی دەخورێ.

**شیرمێژ:** منداڵی شیرە خۆرە.

**شیرن:** شیرین، شەکر و دۆشاو و هنگووین و ترێی شیرین. جووان، لەبەر دڵان. نێوی ئافرەتانــە. ــــ بوون: خۆشبوونی چەقالــەی تاڵ. پەسند و خۆشەویست بوون.

**شیرنیات:** شەکرۆکە، نوقڵ.

**شیرنیاتساز:** شەکرۆکەساز. ــ ی: شەکرۆکەسازی.

**شیرنشیرنۆک:** مێکووک، مێکۆک. (باد.، هەورا.) بەلەک، بەلێک.

**شیرۆ** (باک.): تافگە، پرژ.

**شیروا:** شیرپایی.

**شیروان:** پارچە خاکێکە لە بارزاندا. ــ ی: هی خاکی شیروان. سەرتالار.

**شیروانە:** شیرپاڵۆک، پاڵووێنە.

**شیروانی:** هی خاکی شیروان، گۆرانییەکی کوردییە. سەرتالار.

**شیروایی:** شیرپایی.

**شیروەشاندن:** ڕاوەشاندنی شیر. *

**شیروەشێن:** ئــەو کەســەیە، کــە لــە شیروەشــاندنیدا ووریــا و شــارەزابێ، شوورنگێڤ.

**شیروشەکەر:** شیروشەکری. زەردێکە بـە سپی بروانـێ. خۆشەویسـت، گەرم، لەگەڵ یەکتری زۆر دۆست.

**شیرها:** شرها.

**شروهەواڵ:** (هەورا.) گوڵێکە وەکوو سووێسنەیە نێوەکەی ئاڵە و کەناری سپییە و خەتێکی باریک و ڕەش و جووانـی بـە نێوەڕاسـتی سـوور و سپییەکەیدا کێشراوە.

**شیرێژ** (هەورا.) هەوێنی پەنیری. (هەورا.) ژاژی، سیراج. ــ ی: دۆ ووشکە. ــ ی تەڕ: شیراج.

**شیرێز** (باک.): چرێش.

**شیرێژە** (خۆ.): ئافرەتێکە لەپێش ئەوەدا کە شیری لە منداڵی ساوای خۆی بڕی بێ زگی پڕبێ.

**شیرێژوڕۆن:** ژاژی و ڕۆن.

**شیرێ مار** (باک.): گیایەکە.

**شیری:** چتێکە ڕەنگی وەڕەنگی شیری بچێ. برای ــ: برایەکە، کە تەنها شیری دایکی یەکتریان خواردبێ.

**شیرین:** چتێکە تامی وەکو دۆشاو و هەنگووینی وابێ واژی تاڵە.
شیرن، مێشین. نێوی ئافرەتانە. جووان، لەبەردڵان. نا ــ: ناحەز، دزێو. نرخدار، ئەم ساڵ دەغڵ ــ ە: نرخدارە.

**شیریناهی:** شیرینی.

**شیرینە:** شۆکە.

**شیرین بوون:** شیرن بوون. خۆشەویست بوون.

شیرین بوونەوە: شتێک یان کەسێک، کە سەرلە کوێ شیرین ببێتەوە. *

**شیرینتر:** خۆشەویست تر. ــ رین: خۆشەویستترین.

**شیرینچک:** چتێکە کەمێک شیرین بێ.

**شیرینخووێ:** خواردنێکە، کە خوێی کەم بێ.

**شیرینزمان:** بریتییە لە مەردومی زمانخۆش. ــ ی: زمان خۆشی.

**شیرین زووان:** شیرین زمان.

**شیرین شاتەرە:** شاتەرە.

**شیرین شاهۆ:** (ئەردە.) شینەشاهۆ.

**شیرینکە:** گچکەی شیرینییە.

**شیرینکردن:** خۆشەویستکردن.

**شیرینکلانە:** شیرینکە.

**شیرین و فەرهاد:** چیرۆکێکی زۆر خۆشی کوردییە لە قەسری شیرین ڕوویداوە بە فارسی و کوردی هۆنراوەتەوە و بە دەنگیش بە گۆرانی دەیڵێن، شیرین دۆستی فەرهاد و ژنی خەسرەوی بووە.

**شیرین وەرەش** (هەورا.): شیرین فرۆش.

**شیرینی:** شیرناهی چتی شیرین، شیرنی، شیرینیایەتی، مێشینی. جوانی. شیرنیات، شەکرۆکە، نوقڵ. شەکر و نوقڵێکە لەکاتی شەکراو خواردنێدا دابەشدەکرێ.

**شیرینی خواردن:** خواردنی نوقڵی (شەکراو) خواردنەوە.

**شیرینی خوواردنەوە:** دابەشکردنی نوقڵی شیرینییە لەکاتی خوازبێنی بووکاندا.

**شیرینی خوران:** خورانەوی شەکراو.

**شیش:** (باک.) جوورە چێشتێکە لە گەفەکوتاوی دروستەدەکرێ. شووشە. (باک.) گەغی شکاوی درشت، ـــ اوەزی. شیشە. جوورە ئاسنێکی درێژە. تاقەت، لە زاراوەی منداڵاندا. ـــ کردن: هەڵگرتن، تاقەتکردن، شاردنەوە.

**شیشان:** گیایەکە گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی هەیە.

**شیشە:** شووشەی پەنجەرە و نیتر. شووشەی ئاو و دەرمانان. (باک.) خشت (بۆ کەباب و هەموو چتێک)، ئاسنێکی درێژ و باریکە. ـــ ی تفەنگ: (باک.) بست، زمە، گاش، بستک. مرازێکە لە کەرەستەی تەونی. (فە.) شووشە.

**شیشەی ئاسن:** (باک.) جاخ، ڕۆست. ـــ ی تەندووری: بستە.

**شیشەبەز:** شووشەساز.

**شیشەک** (باد.): شەک.

**شیشەی تەندووری:** شیشەیەکی درێژە ئاگری تەندووری پێ خۆش دەکرێ.

**شیشەی کەبابی:** شیشەییێکە کەبابی پێ دەبرژێنن.

**شیشەی گۆرەوی:** شیشکەی چنین و دروستکردنی گۆرەوی.

**شیشەی مەی:** بوتری.

**شیشک** (باک.): دەرزی چنینێ.

**شیشکەباب:** شیشەی کەباب.

**شیشکردن:** هەڵگرتن، تاقەتکردن، شاردنەوە (زاراوەی منداڵانە).

**شیشکورتان:** شیشەیەکە کورتانی پێداخننەوە.

**شیش لێدان:** فرۆفێڵ کردن، هەڵخەڵەتاندن.

**شیشمان:** مرۆی قەڵەو و ئەستوور و تێکسمڕماو.

**شیش مەلوو:** ئاسنێکە وەکوو داس دەسکدارە و لووت تیژ و درەوان لە مەڵۆی دەدات پێی هەڵدەگرێ و پێی شێ دەکاتەوە ئەوەکو مار لەمژێر مەڵۆکەدابێ و پێوەبدات.

**شیشۆقە** (موک.): لەتکە سوواڵەت و شووشەی ڕەنگا و ڕەنگ، قاشیلە، قاشولە.

**شیشێ** (هەورا.): شووشە.

**شیشێ کردن:** شاردنەوەی شت (زاراوەیەکی منداڵانەیە).

**شیعە:** ئەو چینە موسوڵمانانەن، کە تەنها عەلی بەجێ نشینی پێغەمبەر (د.خ) دەزانن.

**شیف:** (باک.) چێشتی ئێوارێیە، شیف. شیار، وەرد، شێو، شۆ. (باک.) هەردووک لا شیپانی دەرگەیە.

**شیفتە:** سووتاو و برژاو.*

**شیڤ:** (باک.، باد.) شێو، چێشت. نانی ئێواریێ، شیڤ. (باک.، باد.) شیو، دۆڵ، نەواڵ. لکی ڕاست، داردەست.

**شیڤەڕێ** (باک.): باریکەڕێ.

**شیڤک** (باد.): کۆرەشیو.

**شیق:** (باک.) شەقە، تەقە، دەنگێکی بێ ڕێ و جێیە.

**شیقێن:** دەنگی بەرز.

**شیک:** بالآبەرز، ڕێک و پوخت.

**شیکە:** شەکە، بەرازی مێینگەی یەکساڵانەیە. کوودەکە بەرازی یەکساڵانەیە. کەڵگا.

**شیکراوەوە:** قوڕ و خوری و لۆکەی شێکراوەوە و خۆشکراو.

**شی کردنەوە:** لێک جووێ کردنەوە.

**شیلاتی** (باک.): شیلاهی.

**شیلافە:** ژیلافە.

**شیلاڤ** (باک.): گوڵەشیلان بێ بۆنە، پژدان، پزی(ڕەحم)، منداڵدان.

**شیلاق** (باک.): چتی شلی لەشییە وەکو خوێن، کێم و هەوا، چڵم، فرمێسک و نیتر.

**شیلان:** دارێکی دڕاوییە، گوڵ شیلان، بەرەکەی خڕ و سوور و خۆشە. (بۆتا.) شایی و زەمزەمە و ئاهەنگێکی گشتییە، کە بە بۆنەی بەهار یا جوونە سەر چاکێکی دەیکەن نەک بۆ ژنهێنان. نێوی مووروویێکی سووریشە، کە وە بەری دارەشیلانێ دەچێ.

**شیلانە** (هەورا.): قەیسی، شلانە.

**شیلانک** (موک.): سۆندە.

**شیلاو:** شەربەت، بۆ دۆشاو و هەموو چتێکی شیرین دەست دەدات.

**شیلاووک:** (هەو.) شیلک، (باد.) فرش، (شا.) ژیللەوک، (باک.، کە.) فرشک، فریشک، (هەورا.) شردان، شیلاووگ.

**شیلاووگ:** شیلاووک، پارچە گۆشتێکی لۆچ لۆچە لە زگی ئاژاڵاندا وەک هەزارلۆغانە، بەڵام ئەمە پانترە و پڕە لە پیسی.

**شیلاوکە:** شیرە، شیلەییێکە لە میوە بێتە دەرێ، هەنجیرەکە شیلاوکەی لێ هەڵنیشتووە.

**شیلە:** (خۆ.) گچکە. ددانی شیری وولاخانە. جووانووەکە شیرەخۆرێ. بە ددانی وولاخی بەرزەش دەڵێن، کە لە چوار ساڵیدا دەری دەکات. شیرەی جۆ و گەنم لە فەریکیدا. ـــ ی ترێ و چتی شیرین، ئاف شیلە، شیلی، مەی. دۆشاو، شیلەی شەکر.

**شیلەپانە:** (دزە.) گیایەکە وەکاڕووشی دەچێ لەنێو برنجی شین دەبێ بەقەد چەڵتووکیش بڵند دەبێ.

**شیلەپە** (موک.): مرازێکی جووتییە، بەروولە.

**شیلەتین:** شیرەتێن، شیرتێن.

**شیلەجۆ:** شیرەجۆ، جۆشیرە، کاتێکە جۆ شیرەکەی ڕەق بووبێ نزیکی گەیشتن و درەوکردنی هاتبێ.

**شیلەشووانانە:** گیایەکە.

**شیلەوگەرم:** شیرەوگەرم. شلەمەنییەکە نەزۆر سارد و نەزۆر گەرم بێ.

**شیلک:** (هەو، ڕەوا.) شیلاوکی ئاژاڵانە. ـــ ی سەری: بە شلکەی سەرەوەی نێوچاوانیش دەڵێن.

**شیلمە:** (ڕەوا.) جوورە دانێکە دەنکی خڕە و ڕەنگی بۆرە و کلکێکی باریکی پێوەیە وەکو داروجانە، بەڵام درێژترە، پتر لەگەڵ جۆی دەبێ و دەغڵی تاڵ دەکات.

**شیلۆ:** شێلوو.

**شیلۆکە:** (باک.) تەڕ. جیهان شیلۆکەیە: دەباری و تەڕ و تووشییە.

**شیلی:** (باک.) ناوی گیایانە، شیلە. شیلیا قەلوونێ: خڵتەی قەلیانێ.

**شیم** (دەر.): ئێوارێ.

**شین:** کەوە، کەوور. ڕەنگێکە وەکو ڕەنگی ئاسمان و دەریا و گیا. ـ بوون: ڕووان. ـــ کردن: ڕوواندن. شیانن، دروستکردن. (باد.) شووڕێن. (هەورا.) ڕژیین، چوون. بۆرژن، شیوەن، چەمەر، گابۆڕ، بەکوڵ بۆ مردووان گریان، زاری. ـ خووەدانین: شین گرێدان. ـ هلانین: واز لە شین هێنان. شینکە.

**شیناو:** ماستاو یا دۆیەکە ناوی زۆر تێکرابێ و ڕوون بێ.

**شیناوەردی:** سەوزایی، کەسکایی، هێشناتی.

**شیناهی** (باک.): شینایی.

**شینایی:** شیناهی، هەشیناتی، زرچک، سەوزایی، سەوزەوات، سەوزییەکە لە زەویدا ڕووابێ.

**شینە:** (باک.) شین بۆرە. زۆر گەورە، زۆر ناقۆڵا. ـــ زەلام، شینە سەرکاڵ.

**شینەبارانە:** خوڕڕەمەبارانە.

**شینەبێ:** شۆڕەبی.

**شینە سەرکاڵ:** شینەزەلام، (باد.) لۆق لۆقێن. بۆ کەسێکی زۆر زەلام و ناقۆڵا و سووک بەکاردەبرێ.

**شینەشاوە:** باڵندەیێکە، شینەشاهۆ، شاوە، شاهۆ، مەلێکی لاق و مل درێژە.

**شینەشاهۆ:** شینەشاوە، شیرین شاهۆ، پەلەوەرێکە بەقەد لەگلەگییە و گۆشتیشی دەخورێ.

**شینەوارک:** شوورێنێکە، کە چتی تێدا بووبێ و کۆکرابێتەوە لەپاشان بچی بۆچت تێدا دۆزینەوەی.

**شینباو:** چتێکە بەسەر شینیدا بڕوانێ.

**شین بۆر:** (هەر.) مەرێکە سەر و گوێی شین و لەشی بۆربێ.

**شین بۆربەڵەک:** (هەر.) مەرێکە سەر و گوێی شین و لەشی بۆربێ و پەڵەی سپی لە لەش دابێ.

**شین بۆرە:** شینێکی سپی پاتە. (هەورا.) قەزوانی.

**شین بۆز:** وولاخێکە ڕەنگی سپی و شین بێ.

**شین بوون:** ڕووانی ڕووەکان، سەوزبوون.

**شین بوونەوە:** مەبەس لە کەسێکییە، کە لە جێگایەکی بێ و هەر هەڵنەستێ و بەجێی نەهێڵێ. لەسەرمان ـــ . دەرکەوتن و نوواندنی چت لە دوورەوە بە ڕەنگی شین، ئاسمان لە دوورەوە شین دەچێتەوە.

**شین چوونەوە:** شین نوواندن و شین دەرکەوتن. *

**شین ڕەش:** مەرێکە سەر و گوێی شین و لەشی ڕەش بێ.

**شین ڕەشبەڵەک:** مەرێکە سەر و گوێی شین و لەشی ڕەشبێ، بەڵام پەڵەی سپی لە لەشیدابێ.

**شین سپی:** (هەر.) مەرێکە سەر و گوێی شین و لەشی سپی بێ.

**شین سۆر:** (هەر.) مەرێکە سەر و گوێی شین و لەشی سوور بێ.

**شین سۆر بەڵەک:** مەرێکە سەر و گوێی شین و لەشی سووربێ و خاڵی سپی لە لەش دابێ.

**شینشینک:** (کۆ.) داکەمارانە، داکەمار، (باد.) خووەلیسە، زیندەوارێکە زەرد و کەسک و شینی هەیە.

**شینک** (دهۆ.): پشتێند. گەلاکوتک. شوواشینک. (باد.) پارچە زیخمالێکی شینە بە بەرقەدی چیا و گردانەوە. شینکە.

**شینکاڵ:** ڕەنگێکە بە شینی بنوێنێ.

**شینکایەتی:** تیرەیەکی کوردە.

**شینکە:** جوورە تفەنگێکە لە دەمەوە دادەگیرێتەوە. تفەنگی ساچمەزەن، کە لە لوولەوە باروت یا ساچمەی تێدەکرێ. زەوی لم و زیخەڵان، کە بەکاری کشتوکاڵ نایەت و گیای لێ سەوز نابێ. کەوەڵە، برینێکە لە پەنجە دەردێت وەکو موو بە ژان و ژووارە. (ئەردە.) شین، کەووگ، سەووز.

**شین کردن:** شیوەنکردن. ڕەنگ کردنی چتێک بە ڕەنگی شین.

**شینکردنەوە:** شین چوونەوە.

**شینکی:** نەسپێکە ڕەنگی شین بێ.

**شینگا:** شینگە، شوورێنێکە شینی و شیوەنی لێ بکرێ.

**شینگە:** شینگا.

**شینۆک** (باک.): قەزوان، کەزوان. زیپکە و قنچکەی ئاو و کێم و هەوادار.

**شین و شەپۆڕ:** شین و گابۆڕ، شیوەن بە دەستی گەل لەگەڵ لە خۆدانێ.

**شین و گابۆڕ:** شین و شەپۆڕ، دادوهاوار و ڕۆڕۆ لەکاتی شیوەنێدا.

**شینی:** ژمارەیێکی زۆر، دەستەیێکی زۆر. (باک.) شین، شیوەن. (باک.) شیناوەردی، شینایی. گیایەکە شین بووە، دەخڵەکە شین بووە.

**شینی گایانگێو:** جووەمار، گەورەمار، مارێکی مەیلە و پان و ئەستوورە و خاڵخاڵ و شەرفرۆشە.

**شیو:** چەم، دەرە، دۆڵ، خڕ، گووهۆر، بەست، شیف، نەواڵ، شیڤاک. جلک شووشتن، جلشۆرین، (هەو.) کۆڵ. (شە.) دەرگ، (هەورا.) کووڵ، (باک.) بالاف. ـــ کردن: جلک شوشتن. چێشتی ئێوارێ، نانی شەوێ، (هەورا.) چاشتی. چێشت.

**شیوارە:** لاکێش.

**شیواز:** شێواز، تۆرە. دەستوور، شێوە.

**شیوە:** شێوە، ڕیچوون، شێواز.

**شێوەخووار:** لەوەڕاندنی ئاژاڵە ئێواران لە دوای تێبەردان و هەڵاواردنیان.

**شێوەرۆک:** (ڕەوا.) شیوی ناو چیایانە.

**شێوەڵە:** خڕ، کەند، دۆڵ، دەرە.

**شێوەڵۆکە:** خڕو کەندی گچکە. چێشتەقوڵە.

**شێوەن:** شین، شەپۆڕ، ناڵەوزاری، گابۆڕ، گریان و ڕۆڕۆ. بۆ ڕژان. بە دەستی گەل لە خۆدان و شین و گابۆڕکردن و گریان.

**شێوەنکردن:** شین کردن.

**شێوەنگا:** جێگایەکە بە دەستە شینی تێدا بکەن.

**شێوەن نامە:** هۆنراوە یا ووتارێکە، کە بە بۆنەی شیوەنی یەکێک دانرێ.

**شێوەوار:** کاسە دراوسێ، ئەو چێشتەیە بۆ دەراوسێی تازە دەبرێ. کاسە، سفرە.

**شێوەهەینی:** چێشت بە هەژاراندانە لە ئێوارەی هەینییاندا.

**شێووت:** شوویت، (ڕەوا.) دۆراغ، مەزرە، گیایەکی دەستچێنە لە دۆو کفتەی دەکرێ.

**شێوشێوانێ:** چێشتە قوڵە، شێوەقوڵە.

**شێوکردن:** شێ کردنەوە.

**شێوکریاگ:** شێ کراوەوە.

**شێومردێر** (ڕەوا.): جێگایەکە مالاتی تۆپیوی لێ فڕێ دەدرێ.

**شێوی** (باد.): خان و شێوی ئێوارانە.

**شێرکتک:** ئاڵقەتیز، خوژیلک، قوشیلک، شیرکوتک، گیایەکی لک زۆر و پەلک زراو و درێژە ڕەنگی شینێکی سپی پاتە. کلۆ قەندێک بە ئاستەم بەشیرەکەی تەڕکرێ و بخورێ بۆ زەرداو و گرفت زۆر باشە، ئەگەر تنۆکێکیش لە شیرەکەی لەنێو شووشەیەک ئاو بکرێ و بشڵەقێ و لە شووشە ئیستکانێک بخورێتەوە بۆ گرفت و کەوتووتی و زەرداو زۆر باشە.

# ع

**ع:** تیپێکی ئابێی کوردییە. ئەم تیپە تاق و لۆق نەبێ وەکوو (عەعە) لە زاراوەی منداڵاندا هیچ ووشەیەکی تر بەم تیپە نانووسرێ و نیمانە و هی ئێمە نیە ئەوا بۆ بەڵگە و ڕوونکردنەوە چەند ووشەیێکی لەخووارەوە دەنووسم کە تیپی عەینیان تێدایە و لەناو زمانی ئێمەش بەکاردەبرێن بەڵان لە بنچینەدا یا هی ئێمە نین یا تیپی (ا) و(ح) کراوەنەتە (ع).

**عا:** ووشەییکە کار و بەرخی پێدەگێڕنەوە لە بنچینەدا: ها و حایە.

**عابا:** عەبا، کومسرە، کوومزرە، هەورانی، عابا ئارەوییە، کوردی لە جیاتی وی قاپووت و فەرەجی و پاڵتۆی هەیە.

**عاجباتی:** چتێکە مایەی سەرسووڕمانی بێ، لە عجیب و عجائب وەرگیراوە.

**عاذاو:** لە عذاب وەرگیراوە.

**عار:** نەنگ، تەشک، بەکوردی (حار)ە.

**عارەب قۆزی:** گیایەکە پێنج شەش قۆڵێ هەیە بەزەویدا پان دەبێتەوە بەرو پشت و کەناری گەڵایەکانی تووکدار و دڕواوییە ڕەنگی گەڵایەکانیشی شینێکی سپی پاتە نێرتکەکەشی تا دوو بست بڵند دەبێ و گوڵێکی ڕەنگ شینی تۆپی بەسەرەوەیە.

**عارەق:** ئارەق.

**عارەقە:** ئارەقە، خووەی.

**عارەقچن:** ئارەقچن، خووەی هەڵچن.

**عارەقچین:** ئارەقچن، خووەی هەڵچن.

**عارەقخۆر:** ئارەقخۆر.

**عارەق دەردان:** ئارەقدەردان.

**عارەق فرۆش:** ئارەق فرۆش.

**عارەق کردن:** ئارەقکردن.

**عارەق کرتن:** ئارەق گرتن.

**عاردان** (سوور. ، خۆ.): زۆرەوانی، لە بنچینە حەرددان، حارددان، ئارددان.

**عارنان:** چاوترسان و تەمبێ بوون.

**عاست:** حاست، ئاست، ڕاست، حەن، بارە، لەبارە، لەڕاست.

**عازەب:** کوڕ و کچی لەخەم ڕەخسیو.

**عازەبە:** وورده برینێکی نێرتک دارە لە ڕووی گەورە کچ و کوڕان دێت.

**عاستەم:** ئاستەم، حاستەم، زۆرکەم، ئەسپایی، سووک. سەخت، دژوار، بەم واتایەش، هەر وەک سەرەوە کرک دەکرێ.

**عاسمان:** ئاسمان.

**عاشق بەند:** خشڵێکی ئافرەتانە هەموو سینگ دادەپۆشێ و بە قولاپی لە هەردووک شانی قایم دەکرێ هەمووی زنجیری زێڕە و پووڵەکەی زێڕیشی پێوەیە.

**عاقل:** فرەزان، ژیر، زانا.

**عالم:** فرەزان، خووێندەوار، خۆنەوار، مەلا.

**عامبازبوون:** ناوقەدبوون، ئامبازە و لەئامێزەوەیە.

**عامبازدبوون:** ناوقەدبوون.

**عاملاندن:** بەخێوکردن، پەروەردەکردن، لەبنەڕەتدا حاملاتدنە.

**عان:** ئان ڕاستترە، حان، دەم، کات، حەل.

**عایلەمەن:** تووخۆر، کوللەخۆر، عەینەمەل، لە بنچینەدا: ئایلەمەل یا حایلەمەل یان هایلەمەلە.

**عاینەمەل:** بڕوانە: عەینەمەل.

**عەبەکە:** کورتکراوەوەی عەبدولکەریمە.

**عە:** بۆ لێخوڕینی ئاژاڵە دەبێ لە بنچینەدا، ئە، حە، هە بووبێ.

**عەبا:** بڕوانە: عابا.

**عەبە:** کورتکراوەوەی عەبدوڵڵایە.

**عەبەنووس:** ئابەنووس، دارێکی ڕەش و نرخدارە چتی لێ دروستدەکرێ.

**عەبدال:** حەبدال، حەودال، سەوداسەر، گراو، دڵدار، ماخولیا. پۆڕی نێر.

**عەبلۆیی:** تیرەیەکی کوردە، لەبنچینەدا حەودزیی یا ئاودزیی یا حەبدزیی بووە.

**عەبرەش:** ئەبرەش، گیاندارێکی مێ یینەی کەم شیرە.

**عەبوور:** ئەبوور، خۆژماندن. ــــ ی: ئابۆری. پارچەیێکی ئاوریشمییە لەسەر دەبەستریٚ.

**عەبوویٚژ** (ڕۆژ.): ئەسپیٚ، لەبنچینەدا حەبوویٚژ یا ئەبوویٚژە.

**عەپی:** حەپی، بۆ منداڵی ساوا بەکاردەبریٚ تا چت بخوات.

**عەتفەک:** (زا.) ئەتفەک، تیلماسکەتریٚ.

**عەتە، عەتەو:** کورتکراوەوەی (عطاءالله)یە.

**عەجەم:** لە زاراوەی کورداندا بە فارس و تورکەکانی ئازەربایجانیٚ دەڵیٚن، حەجەم. ــــ ی: زمانی حەجەمی. خوو و ڕەفتار و کرداری حەجەمی. چەپەچاخی گۆشت کوتانیٚ، ئادەمی ناشی و گێل.

**عەجەنە:** جندۆکە، جنۆکە.

**عەداب:** ئاداب، کێم و خووین پێکەوە.

**عەدلەکە:** حەدلەکە، جوورە گۆرانییێکی کوردییە.

**عەڕڕە:** زەڕە، ئەڕە، نەڕڕە.

**عەڕڕەعەڕ:** ئەڕڕەئەڕ، نەڕڕەنەڕ، زەڕڕەزەڕی کەر و ئێستران.

**عەرەب:** بە کوردی (تات)ی پێدەڵیٚن.

**عەرەبانە:** ناسراوە چیە واتای وەکو هی ئارەوان.

**عەرەبانەی سەربەفری:** تاخووک، (باک.) پاخێڵ.

**عەرد:** ئەرز، زەوی، حەرد لە(ارض)ی ئارەوی وەرگیراوە.

**عەردنی** (باد.): حەردانیییە، زۆرانی، زۆرەوانی.

**عەرەق:** ئارەق.

**عەرەقچن:** ئارەقچن (کڵاو).

**عەرەقچین:** ئارەقچن (کڵاو).

**عەرەقخۆر:** ئارەقخۆر.

**عەرەقدەردان:** ئارەقدەردان.

**عەرەق فرۆش:** ئارەق فرۆش.

**عەرەق کردن:** ئارەقەکردن.

**عەرەق کردنەوە:** ئارەقکردن.

**عەرەق گرتن:** ئارەقگرتن.

**عەرەقگیر:** ئارەقگیر.

**عەرزوحاڵ:** دادنامە، سکاڵا.

**عەرزێل:** هەزراڵ.

**عەرعەر:** سپیدار، چنار، کوردی نییە.

**عەرن:** ئەرن، ڕق، قین.

**عەرنۆکی:** ئەرنۆکی، تووورە، قەڵس.

**عەرک:** ئاشک، ئەرک.

**عەرنەوور:** ئەرنەوور، گەورە و سەرکۆمار. لە باتی داعبا و جانەوەریش بەکاردەبریٚ.

**عەزرائیل:** فریشتەی گیان کێشانە.*

**عەزرەت:** حەزرەت، ئارەزوو و تامەزرۆ.

**عەزیزی:** شەوکراس، کوردی نیە.

**عەسەلا:** دەوار بەخۆی و هەموو کەرەستەیێکییەوە.

**عەسپ:** ئەسپ.

**عەست:** ئەست.

**عەسرین:** ڕق گرتنی مناڵ کە درەنگ ژیریێتەوە، لە ئەسرین هەڵوەراندن وەرگیراوە.

**عەسسە:** ئەسسە، چتی ڕاستی بیٚ گاڵتە.

**عەسکەری:** ئەسکەری، جوورە ترێیەکی کشمیشییە دەنکی درێژە و زۆر ناسکە.

**عەسەبانیٚ:** توورە، قەڵس، (ئارەوییە).

**عەسر:** ئێوارە، چاخ، ڕۆژگار، (ئارەوییە).

**عەشامات:** حەشامات، مرۆی زۆر گرد و کۆبووەوە.

**عەشرەفی:** ئەشرەفی.

**عەشیران:** ئەشیران، جوورە مەقامێکە.

**عەعا:** زاراوەی منداڵانە پێش زمانگرتنیان بە(گوو)ی دەڵیٚن.

**عەعە:** عەعا.

**عەفارە:** بنخەرمان، میوەیێکیشە بەدارەوە مابیٚ لەبەر خراپی.

**عەفت** (زا.): حەپەی سەگییە.

**عەفدال** (زا.): عەوداڵ، هەژاری، ئاوارە.

**عەقل:** زانایی، ژیری، زانست.

**عەگ** (زا.): حەگ، بزنێکە زۆر سپی نەبیٚ.

**عەلەشیش:** قەلەموونە کوردییەکەیەتی.

**عەڵەم** (ئەردە.): بەشگا، شوێنی دابەشینی ئاو.

**عەلەولەمانی** (باد.): ئەلەولەمانی، جوورە هەنجیرێکە.

**عەلبەکی:** ئەلبەکی، (زا.) دەفری مسینی بنکدارە.

**عەلتۆش:** (زا.) ئەلتۆش، کردەوەی بیٚ کەلک.

**عەلۆوجەلۆ:** ئەلۆوجەلۆ، برێتییە لە مەردومی هیچ و پووچ.

**عەلووعەلوو** (باد.): ئەلۆئەلۆ، قەلەموونە.

**عەلی بوردە** (باد.): ئەلی بوردە، نانی مزاش.

**عەلیخانی:** چتێکە وەکو شەدە وایە بەلاٚم ئەم تەختی ڕەش و قەراخی ڕەنگاوڕەنگە.

**عەلیشش:** ئەلی شیش، قەلەموونە.

**عەلی فووڕنە** (باد.): قاقەزی زووری ئەستوور، ئەلیفووڕنە.

**عەمار:** ئەنبار ڕاستترە، شوێنی دەخلٚ و دان و دانەوێڵە.

**عەماراو:** ئەنباراو ڕاستترە، دەفرێکی گەورەی قووڵە ئاسنگەر و پینەچی پڕی دەکەن لەئاو لەکاتی کاردا. چتێکی گەورەی تایبەتیە، کە پڕ بکریٚ لەئاو بۆکار.

**عەمارە:** شاری عەمارە ناوی پێشووی ئاومالٚە و ئاومالٚک بووە.

**عەمارەپۆ:** تەنراوێکە بە هۆی کۆنی و زۆر مانەوەی لە ئەنباردا پوترکاوبێ.

**عەمارەتە:** خانووێکە یەک نهۆم لەژێرەوە بەقەد سەکۆیەک بەرزتربێ لە زەوی، لە(عمارەت)ی تارەوی وەرگیراوە.

**عەمارکردن:** ئەنبارکردن، چت هەڵگرتن لە ئەنبارێدا.

**عەمانج:** ئامانج، نیشانە.

**عەمبە:** عەنبە بەری دارێکی گەرمیانییە، دەبێ حەنبە یا ئەنبە یا هەنبە بووبێ وای بەسەر هاتووە.

**عەمبار:** ئەنبار.

**عەمباراو:** ئەنباراو.

**عەمبزبوون:** ئامێزتێکوەرێنان بۆ زۆرانی یا شەڕ.

**عەمرۆکە:** گیایەکی بەهارییە وەکو گێلاخەی وایە لینجە و تاخورێ، ئەمرۆکە، حەمرۆکە، هەمرۆکە.

**عەمڵە:** تیرەیەکە لە جاف، لە ڕەگەزدا حەمڵە یا ئەمڵە یا هەمڵەیە.

**عەمڵەمەڵ** (شا.): خەزایی، لە کرۆکدا (حەمڵەمەڵ، ئەمڵەمەڵ، یا هەمڵەمەڵ)ە.

**عەممە:** بەری درەختێکی گەرمیانییە، حەمە، ئەمە، هەمە.

**عەن:** بڕوانە: عەعا.

**عەناب:** شیلان، ووشەیەکی بێگانەیە.

**عەنەقتیّ** (ئەردە.): کورتە باڵا و دەنگ زل. دارێکی بەرز و دەرکاویە، بەرەکەی سوور و خڕ و شیرینە لەناوەوەشی دەنکی هەیە گچکەیە، کە وایە عەناب کوردی نیە ڕاستیەکەی شیلانە.

**عەنەزە:** حەنەزە یا ئەنەزە یا هەنەزەیە، بە چارەوێی ڕەسەن دەڵێن، جورێکە لە چارەوێی ڕەسەن.

**عەنبە:** بڕوانە: عەمبە.

**عەنبەر:** گیایەکی زۆر بۆنخۆشە، حەنبەر ڕاستترە.

**عەنبەربۆ:** ئەنبەربۆ، جورێکە لە برنجی سەدری درێژکار و باریک زۆر بۆنی خۆشە وەکو بۆنی ئەنبەری.

**عەنتەر:** مەیمونی نێرەی قوون سوورە ڕاستیەکەی (حەنتەر)ە.

**عەنتیکە:** ئەنتیکە، حەنتێکە، سەیر، چتی نرخدار و بێ هاوتا. — چی: ئەنتیکە فرۆش، کەسێکیشە لە ناسینی چتی ئەنتیکەدا پسپۆر بێ.

**عەنتیکەخانە:** شوێنێکە چتی ئەنتیکەی تێدا دانرابێ.

**عەنتیکەفرۆش:** کەسێکە چتی ئەنتیکە بفرۆشێ.

**عەنزەرووت:** حەنزەرووت، چتێکە وەکو جیوەی تیسوو.

**عەنوا:** ئەنوا.

**عەو:** ووشەیێکە شوان مێگەڵی پێ لێ دەخوڕێ لەبنچینەدا (ئەو یا حەو یا هەو)ە. بڕوانە: عەوعەو.

**عەوارف:** ئەوارث، (باد.) هەور و سامالّی تێکەڵ.

**عەوە:** حەپە، ئەوە، حەپەی سەگی.

**عەوەعەو:** حەپەحەپی سەگی.

**عەوتەعەوت:** حەپەحەپ، حەوحەوی سەگ.

**عەوداڵ:** ئەوداڵ، ئەبداڵ، کەسێکە بەدوی چتێک یا گیانەوەرێکیدا بگەڕێ و نەیدۆزێتەوە.

**عەوعەو:** حەوحەو، حەپەحەپەی سەگییە، وەڕی سەگییە.

**عەیار** (باد.): پێستی مەڕ و بزن. ئەیار.

**عەیارە:** ئەیارە، پەیانە، ئەندازە، ئەندازەیێکە بۆ پێوانی دانەوێڵە و چتی تر.

**عەیارشیرک** (باد.): مەشکە. ئەیار شیرک: ئەیاری شیری.

**عەین:** ناوی تیپێکی کوردییە (ع).

**عەیعەی** (باد.): دەنگێکە ئاژاڵی پێ لێ دەخوڕدرێ.

**عەینەمەل:** ئاینەمەل، حاینەمەل، غەزایی، تووەخورە، باڵندەیێکی بۆرەقنەی دندوک تیژە بە شێوە وەکەندەسمە دەچێ و ڕەنگاوڕەنگە، مێملّی کوللەیە هەرساڵێکی کوللە زۆربێ ئەویش پەیدا دەبێ، هەر ساڵێکی کوللە نەبێ ئەویش دیارنیە کاتێکی بەگژ کوللەدا دەچی زووزوو خۆی لە ئاو هەڵدەکێشێ تا نزیکی ئاو نەبێ شەڕێ ناکات چونکو ژاری کوللەکە توک و پەڕی هەڵدەوەرێنێ ئەگەر زوو خۆی نەشوات.

**عەییار:** ئەیار، ئەییار، حەییار، زۆرزان و فێڵباز.

**عرک** (باد.): چیکلّدانە، ئاشگە، ڕەنگە ئرک بێ.

**عشتر:** ووشتر، حوشتر.

**علعوول:** چتی زۆر بچووک.

**عن** (هەورا.): قوون، دەبێ لەبنچینەدا ئنە، حنە یا کنە بووبێ.

**عنە:** بڕوانە: عن.

**عنجک** (ڕۆژ.): ڕق، قین، ئنجک، حنجک، هنجک.

**عوشاق** (بابا.): جوورە مەقامێکە ووشەکە لەبنچینەدا تارەوییە.

**عوشاقی** (بابا.): جوورە ترێیە، ووشەکە لە ڕەچەڵەکدا بێگانەیە.

**عومەرەگێلە:** جوورە مەقامێکە لەقۆریات، ئۆمەرەگێلە.

**عوور:** ئورر، ورر، وورگی گیاندار.

**عوورە:** ئوورە، گەفێکە ئامادە کرابێ بۆ بەباکردن.

**عوورک** (باد.): گیپە، لە ڕەسەندا ئوورک، هوورک یا حوورکە.

**عوورێن:** ئورێن، حوقە، بۆڕەی گا و گامێشییە.

**عوولی:** هوولی، ئوولی، حوولی، ژوور، نهۆمێکە لە خانووبەرە.

**عوویرک** (باد.): وورگ، ئوویرک.

**عیباری:** ئێباری، چەپەڵ، نەگبەت.

**عیتی** (ئیرەوان): جنێو، لەبنچینە دەبێ ئیتی یا حیتی یا هیتی بووبێ.

**عیسان:** لەانسان وەرگیراوە و کوردی نیە.

**عیسک** (باد.): نزگەرە، لە هەنیسک وەرگیراوە.

**عێل:** ئێل، خێل چەند هۆزێکە کە هەموویان بچنەوە سەر یەک باپیرە گەورە.

**عێلالەت:** ئیلالەت: کۆمەڵێکی زۆر گەرەیە لە مەردوم.

**عێلام:** حیلام، ئێلام.

**عێلجاری:** ڕەشبگیر، گەلەکۆمەگی، ئێلجارییە.

**عیشوە:** ناز، جیلوە، جیلوەجان، لەنجە، لار، خەمزە.

**عیشوەگەر:** نازفرۆش، جیلوەگەر.

**عیشوەگەری:** نازفرۆشی، جیلوەگەری.

**عیفریت:** کوردی نیە، دێو، دیوەزمە.

**عینسان:** لە انسان وەرگیراوە.

**عیوارش** (باد.): گێرەلووکە. فشس.

# غ

**غ:** تیپێکی نابێتی کوردییە. ئەم تیپە بە بیروباوەڕی من لە زمانی کوردیدا نیە دروای ئەوەی کە ئارەوان کوردستانیان داگیرکرد ئەو جوورە دەنگ و تیپانەش بە نۆرەی خۆیان شیرازەی ئەلف و بێ یەکەمانی تێکداوە ئەگەر کورت بینێک بڵێ چدەکەی لەباغ، باغچە، غار، غاردان، غەزێم، غەم، غەمگین و غولۆر و ئیتر؟ دەڵێم ئەوانە لەبنچینەدا ئاوان: (باخ، باخچە، خار، خاردان، خەزێم، خەم، خەمگین و خوللور)ن.

**غانز:** خانز، دڵ سست بوون بەهۆی سەرمابوون یا گەرمای زۆرەوە.

**غالام** (موک.): کەڵی خەساو.

**غار:** ترات، پرتاو، خار، ڕا، تاو، لنگ، بەز، چووار ناڵە. ـــ کردن: ڕاکردن، بەزین، غاردان، لنگدان. ئەشکەوت، زاخورر، خوولولیف، هاڵ، کۆڵ. (باک.) گوللە.

**غارا:** خارا، جوورە کرێکی ئاوریشمی جووانە وەک قەنەووز.

**غاران:** خاران.

**غاراندن:** خاراندن.

**غاراو:** خاراو.

**غارە:** خارە، ئەشکەوت.

**غارپێدان:** خارپێدان، بەزاندن، ڕاپێکردن، لۆغاندن.

غاردان

**غاردان:** خاردان، ڕاکردن، لینگدان، هەڵڕاکردن، دەرپەڕین، هەڵلینگدان، تاودانی وولاخی سوواری.

**غارغارێن:** خارخارێن، هێنان و بردنی وولاغ بەتاو.

**غارکردن:** تاودانی وولاخ، خارکردن.

**غارین:** خارین.

**غاریو:** خاریو.

**غارناگ** (باک.): خازناک، خاس نا، ناچاک، پیس، چەپەڵ، نەگریس.

**غازی:** دوو چەشنە پوولە یەکێکیان گچکەیە و زێڕە ئەویتریان گەورەترە و زیوە.

**غالغال** (باک.): گالگال.

**غالیگە:** خالگە، هوڵۆڵی کەلەکە.

غام

**غام** (دزە.): قومار، گەمە، نۆبەدەستە لە قومارێدا.

**غاینەمەل:** خاینەمەل، خەزایی، تووخۆرە.

**غەڕ** (کە.): شووم، دەمۆڕ.

**غەڕڕە:** بایی هەوا، لەخۆ دەرچووک.

**غەڕە:** خەرە، غەڵ، دیوارێکە بە ووشکەبەردان هەڵچنرابێ لەکەنار گۆڕستان و باخ و باخچە و حەوشان.

**غەربەند:** غەربەنگ، خەربەنگ، چڵەگیایەکە قامکێک ئەستوور و ئەژنۆیەک بڵند دەبێ، گەڵایەکەی قامکێک درێژە قەراخەکانی زمانەزمانە و لێک بڵاوون لەسەرەوەی چەند لکێکی کورت دەردەکات سەری هەر لکەی کۆمەڵە گوڵێکی سوور و بۆر و زەرد دەردەکات وە هێرۆی دەچێ بەڵام گلۆڵەترە، کە گوڵەکانی وەراند لەجێگای وان قاپیلکی وەکو کۆجیلەی پێوەیە تۆوێکی سووری لە هەرزنی ووردتری تێدایە، بۆ داوەشاندنی کرمی قەڵەشتی لێو ودەست وپێ و شووێنانی تر تۆوی خەربەندی لەگەڵ مێو و بەزی ڕەشان لەنێو ئاوری کرێ و سەری بەسەردا بگیرێ و پەردەیەکیشی بەسەردا بدرێ و قاپێکیشی ئاو لەپێش دانێن و داوەشێ میکرۆب و کرمە ووردەکان دەوەرنە ناو قابەکەوە بەڵام لە بیر نەچێ، کە دەبی داوەشێ و لێی درێ تا کرمەکان هەڵوەرن. بۆ چنگنەش زۆر باشە بە دووکەڵەکەی قانگ دەدرێ.

**غەردالە:** خەردالە، گیایەکە هێندەی گوڵەبەڕۆژەییێکی بڵند دەبێ، گوڵی بڵاو و بەتۆپە هەر کەلەی گوڵێکی پێوەیە، تۆوەکەی وە گلێرە ڕەشەی دەچێ و پتر لەنێو کاولاندا شین دەبێ. لە خۆڵەمێشی وی پووشوو دروست دەکرێ.

غەرغەرە

**غەرزا** (خەرزا): دەرەبەگێکی ناودارە.

**غەرغەرە:** خریلە، قرقرە، چچرک، چەرخی سەربیران، (باک.) تارماز، (هەو.) گرگرە.

**غەریبۆک** (باد.): خەریبۆک، جوورە هەرمێیەکە.

**غەزایی:** خەزایی، تووخۆرە، عەینەمەل.

**غەزەتە:** ڕۆژنامە. ـــ چی: ڕۆژنامەچی. ـــ نووس: ڕۆژنامەنووس.

**غەزەر** (خۆ.): بروانە خاڵەڕەش.

**غەزەل:** کرێکی ئاوریشمین و میل میلی ڕەنگاورەنگە وەک شیرداخ. لە چووار تا دووازدە هەڵبەستی دڵداری و ئیترە، بەستە.

**غەزرین:** زیزبوون، خەزرین، تۆران و قسەنەکردنی یەکێک لەگەڵ کەسێکی تر، ڕق هەستان، جەنەگرتن.

**غەزنە:** خەزنە، خەزینە، شووێنێکی قایمە، کە دراو و چتی گران مایەی تێدا هەڵدەگیرێ: لە (مخزنی ئارەوی وەرگیراوە).

**غەزنەکردن:** ئاوەدزبوونی جێگایەک لە لەشی مرۆ و پڕبوونی لەکێم.

**غەزوبەز:** خەزوبەز: گۆشتی زۆر چەور و قەڵەو یا ئاژاڵی قەڵەو.

**غەزێم:** خەزێم.

**غەزینە:** خەزینە، شووێنێکە تایبەتیە لەگەرماو کە ئاوی گەرمی تێدایە، تیان.

**غەزینەکردن:** خەزنکردن.

**غەڵ:** خەڵ، قسن، شوورەی کەناری گۆڕان (قبر) و دیواری قەراخ باخ و باخچان.

**غەلاندن** (باک.): خەلاندن، هێلنج هێنانەخۆ، هێلنج بە کەسێک هێنان

**غەڵبە:** خەڵبە.

**غەڵبەغەڵب:** خەڵبەخەڵبە، دەنگە دەنگی مرۆی زۆر و ژاوەژاویان.

**غەڵدەغەڵد:** خەڵدەخەلد، غەڵبەغەڵب.

**غەلدی:** خەڵدی، تولە.

**غەلین** (باک.): خەلین، کەلین، هێڵنج هاتنەوە.

**غەم:** خەم، پەژارە، پەشێوی، دڵتەنگی.

**غەمبار:** خەمبار، خەفەتبار، پەشێو، خەمین. ــ ی: خەمباری.

**غەمخۆر:** خەمخۆر.

**غەمخۆرە:** خەمەخۆرە، ماسیگرە، دەڵێن ئاوی ناخواتەوە نەوەکو ئاوکەم بێتەوە بۆیە پیاوی چرووکیش وەوی دەچوێنن.

**غەمخۆری:** خەمخۆری.

**غەمخووار:** خەمخووار. ــ ی: خەمخوواری.

**غەمزە:** خەمزە، ناز.

**غەمگیر:** خەمگیر، بەخەم، پەرۆشدار.

**غەمگین:** خەمگین، پرەش، پەرۆشدار. ــ ی: خەمگینی.

**غەمهەڵگر:** خەمخۆر، بەمشوور.

**غەمین:** خەمین، خەمبار.

**غەنە:** بردن و دەرکردنی گۆی (شەقێن)، لەسەر شار بەقاشۆکەمکەمە بەخشکەیی.

**غەنیم:** خەنیم.

**غەوارە:** نەشناس، بێگانە، لە ئەغیار وەرگیراوە، ناوی تیرەیەکی کوردیشە کە کۆچەرن لە ناوچەی سرووچک.

**غەور** (خەوور): کێم و هەوای برینانە، ئەم دەرمانە غەوری برین دەکێشێ واتە کێم و هەوای پاک دەکاتەوە.

**غەوربوون:** ڕۆچوون، خەووربوون، چوونە خووار بە ناخی زەویدا.

**غەوغا:** هەرا، هەراهەرا، غوڵوو، خەڵبەخەڵب، زڵە، قاڵ، کەپوورە پشیەوە.

**غەوغەوە** (باد.): ناوەندی نوستن و بێداری.

**غریب گۆ:** ڕازوێژ، یانوێژ، هەسارەگەڕێن.

**غەیبەت:** خوسپ، پشتەسەر، ناوبردن، داکوتانن، پۆس کراندنەوە.

**غەید** (باک.): جێگایەکە، کە بەسەوزەوات داپۆشرابێ. ڕق، قین، پشم.

**غەیدا:** خەیدا، ناوی بەستەیەکی کرمانجییە. ناوی گوندێکیشە لە ژووررووی بتلیسێ.

**غەیدۆک:** ڕقدار، قیندار.

**غەیدین** (باک.): تورەوسڵ بوون، زیزبوون، ڕق هەستان.

**غەین:** ناوی تیپێکی کوردیە (غ).

**غجی** (باد.): خجی، دۆی کوڵاوە لەدووای پالاوتنی لەپێش ئەوەدا، کە ببێتە کەشک.

**غرغر:** خرەخر، دەنگی وێک کەوتنێ.

**غلەغل** (هەو.): لغەلغ.

**غلتاندن:** قسەکردن بە غڵتە، خڵتاندن.

**غڵتە:** قسەکردنی نەخۆش بە گەروو لەکاتی گیانەللادا، لغە، غڵتەغلت: لغەلغ، لغە، لخەلخ.

**غوبب:** گیانداری قەڵەوی بەکەیف، خوباب، هوباب.

**غوڕابی:** قورابی، جوورە شیرنیاتێکە.

**غورد:** ورلاخی قەڵەو بزۆز و غلوور.

**غورغور:** خوڕڕەخوڕ، دەنگی بای ناوزگە دەڵێن؛ ــ لە ناوزگی بارامی دێ.

**غوڵەغوڵ:** دەنگی خوێندنی یەکێک لەدوور کە تیپ و ووشەی جوێ نەکرێتەوە.

**غوڵغوڵە:** هەراوهوریا و تێکرژانی مەردوم.

**غولولیف:** خولۆلیف، هوولۆلیف، ئەشکەوت.

**غولۆلیک** (باک.): تەرزە.

**غولوور:** لە غرور وەرگیراوە.

**غونا:** هەرێمێکی گچکەیە لە باشووری ڕۆژهەلاتی (حەسەکە)یە.

**غونچە:** خونچە، ورل.

غونچە

**غیرەت:** ئازایی، پیاگەتی، خرووک.

# ف

**ف:** تیپێکی ئابێی کوردییە.

**فاتەبۆر** (هەورا.): جوورە کاڵەکێکی بۆر و خەتخەت و ئاودارە.

**فاتەبۆرە:** فاتەبۆر. گیایەکی گەڵاپانیشە، جوورە بەرێکی درێژکۆڵەی شیرین دەگری وە کاڵەکی دەچی.

**فاتەڕەشە** (ڕەوا.، خۆ.): سپڵی مالاتانە ئەوەی کە پان و درێژ و ڕەشە.

**فاتەڕەشک** (باک.): جرج.

**فاتەفەرقی** (کۆ.): فاتەفترەقانی.

**فاتەفترەقانی:** (کۆ.) فاتەفەراقی، جوورە دانیشتنێکە لە قەراخ ئاگردان لاقی بە قیتی فش دەکات.

**فاتتنک** (باک.): قومری.

**فاتنک** (باک.): قومری.

**فارا** (هەورا.): گۆڕەوە. ئەوەی پارە و چت دەگۆڕێتەوە.

**فارای** (هەورا.): گۆڕین، گوڕینەوە.

**فارایۆ** (هەورا.): گۆڕینەوە.

**فارزک** (باک.): کیرکافر، شەهوانی، کەسێکیشە زۆر ئەوسن بێ و حەز لە خوواردنێ بکات. (باک.) ــ ی: کیرکافری، شەهوەپەرستی.

**فارس:** گەلێکی ناسراوی ئاری نەژادە، خاکێکی ئەوانیش تێدا دادەنیشن فارس (پارس)ی پیدەڵێن.

**فارسی:** زمانی فارسی.*

**فارن** (باد.): خارن، خواردن.

**فارناى** (هەورا.): گۆڕاندن.

**فارياى** (هەورا.): گۆڕان.

**فاسۆن**: جوورە کرێکی نرخدارە لە خوری دروستدەکرێ.

**فاسۆنيا**: فاسۆن.

**فاسووليا**: بەری گیایەکییە وەک پاقلە وایە و دەکرێ بەچێشت، ناوی گیاو بەرەکەشیەتی، بەرەکەی دانەوێڵەیەکی دەنک سپی و پان و گەورەیە و لە پاقلە گچکەترە لە کەلوو دایە وەکوو پاقلە و ماش دەکرێتە چێشت و دەخورێ.

**فاش**: بڵاو، ئاشکرا. ـــ بوون: دەنگ و باسێکی نهێنییە بدرکێنرێ و بڵاوبێتەوە.

**فاشفاش** (ئەردە.): ئاشکرا، بێ پەردە.

**فاشبوون** (ئەردە.): ئاشکرابوون، بڵاوبوونەوە.

**فاشکردن** (ئەردە.): ئاشکراکردن، بڵاوکردن.

**فاف** (باک.): کۆنە شارێکە لەناو ئۆمەریانە کەوتۆتە رۆژهەلاتی ماردینی.

**فافۆن**: کانێکی سپییە هەموو جوورە کەوچک و قاپ و ئامانێکی لێ دروست دەکرێ.

**فاق**: لکی دارانە. فاقە. (ئەردە.) عابایەکی رەشە ژنان بەسەریدا دەدەن.

**فاقە**: دارێکە وەکوو قەفی گۆچانی ژێیەکی لە هەردووک سەری دەخەن، چەڵمەیە لەم سەرەوسەری ژێیەکەی دەخەن باڵندەی پێدەگرن، فاق، تەڵە، (ڤەر.) خەپک.

**فاقدان**: لەناوەوە چوون و کزبوونی گیان لەبەر، لەڕی و لاوازی.

**فاقفاق** (باک.): گلەیی و گازندەی زۆر.

**فاک**: فێڵ و فەرەج.

**فاک وفیک**: هەوەس، ئارەزوو: ئارام لەـــ ی خۆی ناکەوێ، کەیف و شادی و خۆشی، کەڵکەڵە: ئازاد کەوتۆتە سەر ـــ ی ژنهێنان. ـــ کردن: کەیف و خۆشی کردن، خۆهەڵکێشان. (ئەردە.) دەنگ و باس، ووتی ووتی.

**فاڵ**: (ئەردە.) مروا، بەخت، چارەنووس، رۆدا، شانس، رەمڵ، نوقلانەی خۆشی. ـــ گرتنەوە: داخوورت گرتنەوە، رەمڵ ئاویژتن. ـــ ی باش: نوقلانە، خاس وێژی، خۆش وێژی، ـــ ی خراو: قرە، قڕاندن. هاتنە تەڵەبی ماین و ماکەر، خەڕڕەمە، مائین بەراز. ماینەکەبە ـــ ە، بۆ وولاخ و هیتر: گوهنێل، گووهنێر، گوهنەنێل، بۆ رەشە وولاخ و ماین: بە تەڵەب، بەفاڵ، بەکەڵ، بۆ سەگ و پشیلەی مێ (با) یە: بەبا. (کە.) راوکەی مریشکێ.

**فالا** (زا.): بەتاڵ، خاڵی.

**فاڵە** (ئەردە.): فاعلە، کارگەر، کاریگەر.

**فاڵبەند** (باد.): جادووگەر.

**فاڵچێتی**: جادووگەرێتی، خەریکی فاڵگرتنەوەبوون.

**فاڵچی**: جادووگەر، رەمڵچی، کەسێکە فاڵی بۆخەڵکی بگرێتەوە.

**فالق** (باک.): دەسکەگوڵ و هیتر.

**فاڵگەر**: فاڵچی.

**فاڵگر**: فاڵچین، فاڵگیر، ئیغری گیر، بەختوێژ.

**فاڵگرتن**: هاتنە فاڵی ماین و ماکەر، ئیغری گرتن.

**فاڵگرتنەوە**: بەختگرتنەوە.

**فاڵگیر**: ئیغری گیر. بەخت وێژ، فاڵچی.

**فالۆزە**: فرنی.

**فالووز**: فانووس.

**فالهاتن**: هاتنە فاڵی ماکەر و ماین، ئیغری هاتن، ئیغری خووازتن.

**فام**: تێگەییشتن.

**فامیدە**: تێگەیشتوو، ژیر، تێگەییک، زانا.

**فامین**: تێگەییشتن.

**فانۆز**: فانووس، چرای دەستی.

**فانووز**: فانووس.

**فانووس**: جوورە چرایەکی دیار و ناسراوە، فەنەر بەدەست هەڵدەگیرێ و شووێنی تاریکی پێ رووناک دەکەنەوە و مۆم و فتیلیان تێدا هەڵدەکرد.

**فانووسی جادووگەری**: سینەما.

**فانیلە**: جوورە کرێکی دەزوو یا خورییە، کە لەدەزوویێ لە ژێر کراسەوە کە لە خوری بێ لەسەر کراسەوە زستانان لەبەر دەکرێن.

**فاو**: لە بنچینەدا فراوە.

**فایتوون**: پایتوون، گالیسکە، فیتۆ.

فایتوون

**فە**: پفە، چێشت، زاراوەی منداڵانە.

**فەت** (فە.): کاری ناڵەبار و گەند.

**فەتاح پاشایی**: جوورە هەڵپەرکێیەکە. جوورە پارچەیەکیشە لە کارگەی فەتاح پاشا دەردەچێ.

**فەتار**: شەقار، درز، شەقار؛ بێستانەکە شووتیەکانی شەقارشەقاربوون، فەتارفەتاربوون واتە قەڵشاوون و درزیان بردووە.

**فەتارەت**: کارەسات، بە ـــ دان: زیان پێگەیاندن، لەنێو بردن، بە ـــ چوون: لەناوچوون.

**فەتارفەتار**: شەقارشەقار، هەلاهەلا.

**فەتال** (باک.): باو، رۆژ باشی، سلاو.

**فەتاندن** (باک.): زەوی ژیاندنەوە، دووبارە کشت و کاڵ دەست پێکردنەوە

**فەتاندی** (باک.): چاندراو.

**فەتە**: کورت کراوەوەی فەتحوڵڵایە.

**فەتراک**: زیان، دەرد و ئازار.

**فەتراک دەر**: زیاندەر، ئازاردەر.

**فەترۆمە** (باک.): پەیوەند بۆ دار و بار و چتی تر. ـــ کرن: پەیوەندکردن.

**فەتسان** (باک.): خنکان، خەفەبوون، قەڵشان.

**فەتساندن**: خنکاندن، خەفەکردن.

**فەتسی** (باک.): بێن، پشوو. خنکا.*

**فەتسین** (باک.): خنکان، خەفەکران، قەڵشان.

**فەتکار**: (فە.) فەتکەر، گەندکار، خراوکار. ـــ ی: گەندکاری.

**فەتووت** (هەورا.): ـــ بیەی: داقنینەوە.

**فەتهاندن** (باک): فەتاندن.

**فەتێ**: ناوی کوڕانەو کورتکراوەی فەتحوڵڵایە.

**فەتهین** (باک.): زەوی بۆ کشتوکاڵ ڕەنیوهێنان.

**فەتیر**: هەویرێکە هەڵنەهاتبێ و خاوبێ نانێکیشە هەویرەکەی هەڵنەهاتبێ، هەڵنەهاتگ، بێ مایە، نەترشیاگ.

**فەتیرە**: نانی فەتیری هەڵنەهاتوو.

**فەتیل** (باک.): فتیلە.

**فەجێ** (ئەردە.): کورتکراوەوەی فەرەجوڵڵایە.

**فەخفووری**: چینی، دەفر و ئامانی چینی.

**فەد** (باک.): شیوی گچکە، دەرە، شیو. ــ ی: شەرم، فەهێت. ــ ی کرن: شەرمکردن. ــ ی بوون: شەرم کردن.

**فەدیتی** (باک.): شەرمەزاری.

**فەدیکار** (باک.): شەرمەزار. (باک) ــ ی: شەرمێوونی.

**فەدیکرن** (باک.): شەرم کردن.

**فەدیۆک** (باک.): شەرمکار، فەهێتکار.

**فەر** (باک.): چت، وڕلاغ، کەسێکە تاکی جووتێکی ساز بکات، لنگ، لنگە. (باک.) یەک، تاک، تاق.

**فەڕ**: پیرۆزی، شان و شکۆ، کەڵک، پیت، بەرەکەت، پایەبەرزی، بە ــ : پیرۆز، بەکەڵک. بەد ــ : شووم، ناپیرۆز، بەدوودم، بەدفەڕ، گەند، بێ کەڵک. بێ ــ : گزرەییتی.

**فەڕات** (باک.): فوڕات، ناوی زێیەکی ناودارە لە کوردستانی ژێر دەستی ترکانەوە دێتە سووریە ولە باشووری عیراقدا لەگەڵ زێی دیجلەدا یەک دەگرێتەوە.

**فەرازی** (ڕەوا.): گەورەبوون، پتربوون، هەراش، فرازی، (کۆ.) پەرەوازە

**فەڕاشە** (بار.، خۆ.): قفڵ، کڵۆم.

**فەڕاشین** (باد.): هاوینەهەوار.

**فەراقە**: جوورە پێوەندێکە لە پێی بەندییان دەکرێ.

**فەرامۆش**: چتێکە لە بیرچووبێ، لە هۆشە و چووگ، لە بیرە و چووگ، لە بیرنەماگ، لەیادچوو، لەبیر چوو، بیرەوچووگ. ــ بوون: لەبیرچوون. ــ کردن: لەیادکردن.

**فەرامۆشکار**: کەسێکە چتی زۆر لە بیربچێتەوە، بێ هۆش، بێ مێشک، گێژ. ــ ی: بێ هۆشی، بێ مێشکی، گێژی، فەرامۆشی.

**فەرامۆشی**: لەیادکردن، لەبیرکردن، لەبیرچوون، لە بیرچوونەوەی سەخڵەتی و ئازار بەهۆی چتێکی خۆشەوە، فەرامۆشکاری. دڵنیایی، خەمڕەوێنی.

**فەرامۆشی دان**: دڵنیاکردن، خەمڕەواندن، لەبیربردنەوەی ناخۆشی و ئازار.

**فەرامۆشی هاتن**: دڵنیابوون، خەمڕەوێن، لەبیرچوونەوەی سەخڵەت و ئازار.

**فەڕانسە**: خاکێکە، کە نەژادی فەڕانسەی تێدا جێگیربووە.

**فەڕانسەیی**: زمانی فەڕانسان.

**فەڕاهەم**: ئامادە، ساز.

**فەڕاهەم هاتن**: پێکهاتنی چتێک.

**فەڕاهەم هێنان**: پێکهێنانی چتێک.

**فەرە** (کە.): تخوون؛ ناوێرن ــ ی ئەم ناوچەیە بکەوون.

**چصچفەرەج**: فێڵ، فرت و فێڵ، بەڵان لەگەڵ فێڵ نەبێ بە تەنێ بەکارنابرێ: فێڵ و فەرەج.

**فەرەجی**: جوورە قاپووتێکی لبادی نیوقۆڵە تا پشتێندییە و قۆڵی کورتە و بەرگنە بۆ شوان و گاوانان دەست دەدات، کوڵەباڵ، گاکەرک، کەپەنک، کەرک، قاپووت، (باک.) فەرەنجی، لە خوری یا لە بەرگن دروستدەکرێ بێ تان و پۆ بەهۆی سوونیەوە خۆی دەگرێت.

**فەرەشخانە**: دارێکە تەختەیەکی لەسەری دەدرێ زبڵی پێ کۆدەکەنەوە.

**فەرەنجی**: فەرەجی، جوورە کاڵایەکی سەردەرییە لە خوری یا لەبەرگنی سوواوەوە دروستدەکرێ.

**فەڕەنگ**: خەڵکی ڕۆژاوا، فەرانسە، دانیشتووانی ڕۆژاوا و ئورووپا. فەرانسەوی.

**فەرەنگ**: فەرهەنک، زانیاری و زانست.

**فەرەنگستان**: خاکی فەرنگ، وڵاتێکە فەرەنگی تێدا جێ گیربووبێ.

**فەرەنگی**: زمانی فەرەنک. دەردەباریکە، کفتی، سفلیسی، ئاتەشەک، هاڵە، نەخۆشییێکی زۆر پیسە بۆ ئادەمیزاد بۆڕی میزی خراپ دەکات و لە چارەوێش بدات ناوگەڵی بەڵەک و شل دەکات.

**فەرەیدوون**: نێوی پیاوانە.

**فەرتەنە**: ئاشووپ، پشێوی، وەیشوومە.

**فەرتووت**: پیری داکەوتوو، چتی پەڕپووت، فەرفووت، داڕزیاگ.

**فەرخە**: بێچوو.

**فەرخەس** (باک.): گیانداری نیوەخەس.

**فەرخەسێنی** (باک.، باد.): مجۆعمە، سینی.

**فەرخەشێر**: بەچکەشێر، بیووڵەشێر.

**فەرخەکەو**: بارەکەو.

**فەرخی** (بابا.، مەرک.): جوورە ترێیەکی کشمیشی ناسکە، ترێی سەر قووڵە دروای خەلیلی پێدەگات و گلووی لەوی گەورەتر و درێژتره و بۆر و پەڵەدار و دەنکدارە.

**فەڕدار**: بەکەڵک، پیرۆز. ــ ی: پیرۆزی.

**فەردە**: تایەکە لە بارێک، بارێک دوو تا (فەردە) یە.

**فەردەش**: کۆمەڵ کۆمەڵکردنی جێزی دانەوێڵەیە بە بێژنگ یا سەرەد بۆ ئەوەی کە یەکێکیان پێورا ئەندازەی ئەوانی تر دەر کەوێ.

**فەرز**: ــ ی شەترەنجی: فەرزین، سووار.

**فەرزانە**: فرەزان، زۆرزانا.

**فەرزۆ** (باک.): کورتکراوەوەی فرزەندە.

**فەرزین**: دامەیێکە لە دامەکانی شەترەنجی کە پێی دەڵێن وەزیر، فەرز.

**فەرژاندن** (باک.): دڕاندن، پارچەپارچەکردن، پچڕاندن، بفەرژینە.

**فەرژین** (باک.): پارچەپارچەبوون، پچڕان، دڕان.

**فەرسەخ**: فرسەخ.

**فەرسەند** (باک.): دەرفەت، هەل.

**فەرسۆ** (باک.): ناوی ئافرەتانە، لەفارسییەوە وەرگیراوە.

**فەرش** (باک.): رووکار، تاتەبەرد. ـــ ی دەستی: پشتی دەستی. ـــ ی پێ: پشتی پێ. رِاییێخ، ژێرەخەر، رِایەخ، سیپاڵ.

**فەرشە** (هەو.): پنە.

**فەرشەنی** (باک.): نێوچاوان.

**فەرشک** (باک.): مەچی دەستی، مووچەی دەست.

**فەرشکردن**: رِاخستنی ناو ژوور و هەیوان و ئیتر بەحەسیر و مافوور و بەرە. تەختە پۆشکردنی ناو ژوور و هەیوان و حەوشە بەخشتی سوور یا بە کاشی، و ناو ئەستیلَش بە بەرد و قسڵ و چیمەنتۆ.

**فەرفەرا** (باک.): ناوی رووبارێکییە لە جزیرێدا.

**فەرفووت**: پەرتورگیاگ، پەرپووت، فەرتووت.

**فەرفوون**: فەخفووری، چینی.

**فەرقان**: پیران، هاتنەوەیەکی گەروو لەبەر خەفەت و تالاّوی ژیان یا لەبەر گریانێ.

**فەرک** (باک.): ماوە، ووچان. چاندن، جووێ کردنەوە.

**فەرکار**: تێخوڕین و گەیاندنی فەرمان.

**فەرکاندن**: وێنەگرتنەوەی نووسراوێک. پەی بردن بە چتێکی نووسراوی گران، (باک.) لەناو بردن، حەل کردن، هەڵدان. فەرماندان.

**فەرکەم**: پەرکەم.

**فەرکبوونی** (باک.): یەکێتی.

**فەرکین**: حەل بوون، لابران، گۆڕینی کۆنێک بە تازەیەک.

**فەرمان**: کار، ئەمر، دەمبۆڕی، سەرمیانی، خەبات، قانوون، نامەیەکە، کەفەرمانی میر و خونکاری تێدا نووسرابێ، داواکردن و خوڕینی گەورە بەسەر گچکەدا بۆ ئەنجام دانی چتێک، خستنەژێرـــ : هێنانە ژێردەست، فەرمانی میری: دەستوور و نامەی بەرزی میری و پادشای. بێ ـــ: بێکار، ئاوارە.

**فەرمانبەر**: ملکەچ، گوێدێر، ژێردەست، کەسێکە فەرمانی گەورەیەک بەجێ بێنێ. ـــ ی: ملکەچی.

**فەرمانبەردار**: فەرمانبەر، رِام. ـــ ی: ملکەچی، ژێردەستی، رِامی.

**فەرماندار**: دەوڵەتگێڕ، فەرمان بەر، هۆمان، پێشدار، خشەئیتە، چەترمان، کەسێکە فەرمان بە دەست بێ، فەرماندە. ـــ ی: کاقلەپ.

**فەرماندان**: فەرمانکردن، خشا (ناوێ.)، تێخوڕین، تیڕاخوڕین، دەنگدان.

**فەرماندە**: فەرماندار.

**فەرماندەر**: فەرماندە، سەرلەشکر، فەرمانڕەوا، چەترمان، فەرماندار، دەستووردەر. ـــ ی: پێشەنگی کاروبار پێکردن.

**فەرمانڕەوا**: کەسێکە فەرمانی بڕبکا و دەستەلاّتداربێ. ـــ یی: دەستەلاّتداری. فەرمان بڕکردن.

**فەرمانکردن**: فەرماندان بە چتێک، تیڕاخوڕین.

**فەرمانکرن**: بڕوانە: فەرمانکردن.

**فەرمانگە**: دایرەی میری.

**فەرمانگێڕ**: میری، دەوڵەت.

**فەرمان نامە**: تۆماری دەوڵەتی.

**فەرمانی** (باک.): جوورە کەوایەکە.

**فەرمای** (هەورا.): فەرموون.

**فەرمایش**: فەرمووده، قسەی پیاوی گەورە.

**فەرمایشت**: فەرمایش.

**فەرمەسۆن**: کەسێکە بەندیواری بە هیچ جوورە ئاینێکەوە نەبێ.

**فەرموو**: ووشەیێکە لە شێوەی رِێز و شێوازێدا بەکار دێنرێ بۆ بانگ کردنی یەکێک بۆلای خۆت یا بۆ ژوورەوە یا بۆ خواردن یا بۆ رِێگادان یا بۆ ئاخۆتن وئیتر، فەرموو ژوورێ: وەرە ژوورێ، فەرموو بڵێ: دەبڵێ، فەرموو بخۆ: دەبخۆ.

**فەرمووده**: فەرمایش.

**فەرموون**: بۆ ئاخۆتنی کەسێکی بەکاردەبرێ کە رِێزی بگیرێ، بەناوی رِێزگرتن بۆ چەند کەسێکی ئامادەش بەکاردەبرێ بەواتا: وەرن، بخۆن، بدوێن.

**فەروبێز**: پیت و پێز، خێرو بەرەکەت.

**فەرووز** (باک.): پێڵووی چاو.

**فەروفیت**: پیت وبەرەکەت.

**فەرهاد**: نێوی نێرینانە. پاڵەوانی چیرۆکی شیرین وفەرهادێ لە رِێگای شیرین دا زۆری چەرمەسەرە وکارەسات بەسەرهات و بەئاوات هەرنەگەیشت.

**فەرهان**: ترسان.

**فەرهاندە**: ترساندە، زراوبردە.

**فەرهاندن** (باک.): ترساندن، زراوبردن، قەڵەمبازدان.

**فەرهەنگ**: قامووس، پەرتووکێکە، کە کۆمایەک ووشەی زمانێکی بەراقەوە تێدا نووسراو یا چاپکرابێ.

**فەرهەنگۆک**: قامووسۆکە، فەرهەنگی گچکە.

**فەرهوود** (رِۆژ.): تالاّنکردن.

**فەرهیت** (باک.): گاشەبەرد، بەردی زل و لەندەهۆر.

**فەرهین** (باک.): فەرهان.

**فەریاد**: هاوار، قیرەوگازە. فریاد.

**فەریاد رِەس**: فریاکەوتوو، بەهاوار و دادی کەسێکی گەیشتوو.

**فەریاد رِەسی**: بەهاوار و دادی کەسێکی گەیشتن.

**فەریادکردن**: هاوارکردن، لالاّنەوە، دادکردن، دادوبێدادکردن.

**فەریقەت** (باک.): دڵنیا. ـــ بوون: دڵنیابوون.

**فەریک**: وولێن، دانێکی نەرمە، کە هێشتا رِەق نەبووبێ وتەواو نەگەیشتبێ. (ئەردە.) فەتیر، هەویری هەڵنەهاتوو.

**فەریکەجۆ**: جۆیەکە هێشتا تەواو نەگەیشتبێ.

**فەریکەخورما**: جوورە خورمایەکە هێشتا بەتەواوی نەگەیشتبێ.

**فەریکەقەزوان**: قەزوانی نەگەیشتوو، قەزوانی سەوزی نەبەکام.

**فەریکەگوویز**: (هەورا.) کاردەوەژە. گوویزێکە هێشتا بەتەواوی نەگەیشتبێ.

**فەریکەنۆک**: نۆکە فەریکە، نۆکێکە هێشتا ڕەق نەبووبێ.

**فەریک بوون**: تەڕ و نەرم بوونی دانەوێڵەیە، کە لەناو گوڵەکەی دا هێشتا ڕەق و ووشک نەبووبێ.

**فەزحە** (شوا.): بێگار، زبارە.

**فەسال**: (هەو. کە.) دیمەن، قەلافەت، شێوە.

**فەسالدان**: جێ بەجێ کردن و ڕا پەڕاندنی کارێک.

**فەشفەش** (باک.): هاشەهاشی ئاوێ.

**فەقفەقە** (کە.): دەردێکی کوژندەیە، ئازارێکی کوژندەیە.

**فەقێ**: زانستخوا، دانشتخواز. قوتابییەکە لەمزگەوتێدا بخوێنێ.

**فەقێ خەڵیە**: تیرەیەکە لەبڵباسەکانی بیتووێنێ.

**فەقێ مەڵکێ**: تیرەیەکە لە نێو دزەییاندا.

**فەقێوانە**: ئاوستێ، ئەنگوچک.

**فەقێ یانە**: ئەنگوچک، سۆرانی، ئاوسووێنە.

**فەقێ**: فەقێ.

**فەکلە** (هەورا.): کاکۆڵ، تووالێت، لاجانگ.

**فەگڵ** (ئەرد.): مل پێچ.

**فەلات** (باک.): ڕۆژباش، ڕزگاری.

**فەلاتکار** (باک.): ساخ، پرسوود.

**فەلاقە**: چتێکە لە هەردووک لاق دەکرێ و بادەدرێ بۆ دار لە بەری پێدان. نەستەق. لـە کردن: نەستەقکردن.

**فەلاقەکردن**: دارکاری کردنی بەری پێی یەکێکییە لە فەلاقەدا.

**فەلاکەت**: کارەسات، لێ قەوماوی.

**فەلە**: دیان، فەلەم، گاوور.

**فەلەخووێ**: جووتبەندە، جووتێر، دەشتەوار. کەسێکە ئازابێ لـەکاراندا نەترسێ.

**فەلەڕەشە**: جوورە فەلەیەکە.

**فەلەڕەشکە**: فەلەڕەشە.

**فەلەک**: ئاسمان، گەڕ، چەرخ و فەلەک ، ڕۆژگار، چەپگەرد هەرکەسێکی تووشی هەرجوورە چـورتم و نـەهاتێکی بـێ هـاوارودادی هەرلـە دەست فەلەکێ دەکات.

**فەلەمـە**: فەلـەمی حەسـکێفی، حەسـە نکێفـێ . کرێکـی نرخداربـووە لەپێشوودا دەوڵەمەندان لەبەریان دەکرد.

**فەلتاندن** (باک.): ڕزگارکردن.

**فەلتۆیی** (باک.): سەڵیتە، جندە.

**فەلتین** (باک.): ڕزگاربوون. دارسانی خوێنی لـووت بـەربوونی خوێنی لووت. (هەورا) فشیای. (بابا.) پژین. بەربوونی وولاخ.

**فەلسەفە**: باوەڕی زانستی، لەچتی نهێنی و گرنگ ودژوار کۆڵینەوە.

**فەلشاندن** (باک.): پەرێشان و بلاو و پەراگەندە کردن.

**فەلشین** (باک.): پەرێشان بوون.

**فەلق** (باک.): پارچە. بریقەی بەردی خارا.

**فەلقاندن** (باک.): بەشکردن.

**فەلقین** (باک.): بەشکران.

**فەلگێ** (باک.): فلق.

**فەلهیتە** (باک.): زیرەک، بەکەڵک.

**فەلێ** (ئەردە.): لە ( فەلەکناز )ەوە کورتکراوەتەوە.

**فەلیت**: هەندە کارێکە بەتەواوی ژێرنەبووبێ.

**فەلیتە** (باک.): جندە، سەڵیتە.

**فـەلیت فوتـۆ**: (بـاک.) نـاوی قارەمـانێکی جـەنگاوەرە لـەشـەڕێکی کوردستانێ دا .

**فەن**: فەندە. فروفێڵ، کەڵەک، داو، ڕەنگ.

**فەنا** (باک.): وەک، وەکوو. پەنا.

**فەنابێدەنگە**: فەنە بێدەنگ. پەنا بێدەنگە.

**فەنـەبێدەنـگ**: فەنەبێدەنگـە. گەمەیێکـە زۆر گەمـەی عەنتیکـەی تێدادەکـرێ نـابێ کـەس پێبکـەنێ یـا بـاخووێ، چونکـوو هەرکەسێکی پێبکەنێ یا قسە بکا تێدەکەوێ.

**فەنـەر**: فەنـەرک، فـانووس، فـانۆز. جـوورە فانووسێکە. چتێکـە وەک فـانووس لـە چاو یا لـە کاغـەزی چەورکراو دروست دەکرێ مۆمـی تێدا دادەگیرسـێنرێ. هـەرچتێکی بـە پێـچ بنیشـێتە سـەریەکتری فەنـەری پێدەڵێن. کەڤان. تیغێکی نەرمیشـە دەنوشتێتەوە وەک مشـار. فەنـەری کاتژمێر و ئیتر: زەمبەرەک، زەمبەلەک.گوویزانی تراش.

**فەنەرک**: فەنەر، فانووس.

**فەنباز**: فێڵباز، داوباز، کەڵەکباز. ــ ی: فێڵبازی.

**فـەنتازی**: ڕازاوەوە، نەخشـێنراو چـتی جووانـی نـووێ. لێ کریـاگ، لـە کاردەرهاتگ، خاراو، سوواری پێ کراو.

**فەند** (باد.): فانووس.

**فەندرفەن**: فروفێڵ.

**فەندۆ** (باک.): لـەبیروباوەڕی مندالاندا باپیری سەگانە، گـۆیا سـەگ دەلوورێنێ دەوەڕێ، دەحەپێ مندال دەڵێـن گـورگ جووابی دەداتـەوە دەڵێ بەسە با ببینە دۆست وبرادەر سەگیش دەڵێ نابێ نـابێ هـەتا فـەندۆ ژگـۆڕێ ڕابێ (گوایە فەندۆ گورگ کوژتوویە).

**فەندوفێڵ**: فروفێڵ، کەڵەک وکولوورک.

**فەن وفێل**: نەفەندو فێل.

**فەنی**: ناوێکە تەنها بۆتۆلە سەگی بەکاردەبرێت.

**فەهۆ**: شەرم، پاکداوێن.

**فـەهێت**: (بـاک.) فـەدی. شـەرم، شـەرمەزاری. بـێ ـــ: بـێ شـەرم، بـێ چاوەڕوو.

**فەهێت کردن** (باد.): شەرمکردن.

**فەهێتۆ** (باک.): شەرمێوون، شەرمن.

**فـەیرووز**: پیرۆزە، نـاوی مووروویـەکی نرخـدار و نـاودارە، پـیرۆزە نـاوی ئافرەتانیشە.

**فەیزوڵابەگی**: تیرەیەکەلە بەگزادەکانی ئێستای موکریان.

**فەیلەسووف**: سۆتی، زانا، بلیمەت.

**فەیلی:** ناوی تیرەیەکی گەورەی کوردە لەگەرمێنی زۆرن بەلاّن زۆرترینیان لە لوڕستانن زۆرئازاو کارین و بەسەلیقە وکار ڕا پەڕێنن ودەست پاکن نەک لە کوردستانێدا لەگێتی هاوتایان نین یا کەمن.

**فت:** فووکردنە بەکلکی سەبیلەو قەننەدا بۆ دەرپەڕاندنی سووتووی تووتنەکەی سەبیلەکەی فت کرد. (ڕەوا.) قوون. ــ ڕەش: قوونڕەش. چۆڵ، بەتاڵ، ووشەیەکە لەکاتی فڕێدانی گۆڕەوی بازی یا فینجانیناندا بەکاردەبرێ. واتە بۆشە و هیچی تێدانیە.

**فتەفت** (ئەردە.) :سرتەسرت، سرکەسرک.

**فت بوون:** تێکەوتن ودەرچوون لەیاریدا.

**فتخۆش:** قەنگە.

**فتراق:** بەنساموّتە دووبەنی ئەستوور و درێژە بەپاش تەرکی زینییەوە بەکاری بەستن خورج وهەگبەو چتی تردێت. (زاخ.) دڵ، ویست، ئارەزوو. ــ ت داکەوێ: دڵت داکەوێ، هەوای ویست وئارەزووت داکەوێ. (ڕەوا.) ئەندامی شەرمی ئافرەتانە.

**فتراندن** (زا.): بینین.

**فتڕەش** (ڕەوا.): قوونڕەش.

**فترک** (زا.): قارچک.

**فتروونە:** ئەوچتەیە، کەلەچتی تر موتربە بکرێ.

**فتفت** (باک.): دەنگ وهەستی بارینی بەفرییە.

**فتکردن** (هەو.): دەرپەڕاندن، فووتێکردن، فوولەموّدنەکردن، قونچکە جغارە سووتو لێ دەرپەڕاندن. فڕێدانی گۆڕەوی وفینجان لەگەمەی فینجانێن و گۆڕەوی بازیدا.

**فتلتەک** (باک.): قوولاّیی چاو.

**فتلۆپاچک** (باک.): هەڵبەزینەوە، بازدان.

**فتوو** (هەورا.): ووتوو.

**فت و فراوان:** (کە.) زۆری بێ پایان. ئێجگارزۆر. زۆروزەوەند.

**فتێلە** (ئەردە.): فتیلە.

**فتێلک** (باد.): فتیلە، پلّیتەی چرا، (باک.) پۆرگ.

**فتیل:** پلّیتە ئەو دەزوو یا پەڕۆ بادراوەیە کە لەناو ڕۆتکەرچەک وئیتردا لەناو فانووس وچرای دەنێن وهەم بەو پلّیتەش دەلّێن کە لەناو چراو لامپاو فانووس وئیتر دەنێن، پێش نەختێ لەناو ڕۆتکەر چەکی ناوقودێکییان دەناو هەڵیان دەکرد.

**فتیلّە** (هەورا.): پلّیتە، پتیلە.

**فجوور:** ــ کردن: فڕینی کەو وسووێسکەیە.

**فجووز:** گوم بوون و لەبەرچاوان بزر بوون یامردنی گیان لەبەرێکییە.

**فجووزکردن** (باد.): ڕۆیشتنێکی ئێکجارییە، کە گەڕانەوەی لەدووانەبێ. هۆرمز ــ ی کرد: واتە بەئێکجاری ڕۆیشت یامرد.

**فجووق:** (کە.) دەنگی باڵی کەو و باڵندانە لەکاتی فڕینێدا، فڕین وباڵگرتنی کەوە. دەرپەڕین وبەرەلاّبوونی باڵندانە لەقەفەزێدا. فڕکە فڕتکە. ــ کردن: دەرپەڕین و باڵگرتنی کەوە، فڕین و باڵگرتنی کەوە.

**فچ:** لەدەمی گەمەو قەشمەریدا دەلّێن: (کۆ.) فووچ.

**فچک:** دەنگێکە لەدەستی جۆلاّوە دێت لەکاتی جۆلایدا؛ بەلای مالّی جۆلاّدا تێپەڕیم فچک فچک جۆلاّیی دەکرد.

**فچک فچک:** دەنگی یەک لەدوای یەکی دەستی جۆلاّیە لەکاتی کارکردنێدا.

**فچووز:** مالاّواییە بۆ کاتێکی دوور لەکاتێکیدا بەکاردەبرێ، کە مرۆ بە سەفەر بچێ وەلاّمیش هەر فجووزە.

**فڕ:** هۆش، بەندیواری. ــ ی بە جیهانەوە نەماوە. چارە. ــ ت بزربێ. (کۆ.) کان، ڤان، لەجگێنێدا کەسێکی بیدۆڕێنێ دەلّێ لەفڕانم چی. (ڕەوا.، کۆ.) دووجک لەهەلاّوێژتندا لەسەر قیزە یا لەسەر پشت ڕاوەستێ. قوم، قومێک لەچای یا لەقاوە، کە، لێوی پێوە بنێی و بیخۆیەوە. پەیوەندی چتێک بەسەرچتێکی ترەوە. دارا ــ ی بەسەر ژنەکەیەوە نەماوە واتە تەلاّقی کەوتووە. دەنگی خواردنەوەی چتی شلەمەنییە.

**فرازی:** فەرازی، بەخۆداهاتن وگەشەکردن.

**فراڤین** (باد.): خواردنی نیوەڕۆیە.

**فراڤینخوواردن** (باک.): نانی نیوەڕۆیە خوواردن.

**فرامین:** فراوین، فرایین، قاوەلّتوون.

**فڕان:** هەلّفڕینی باڵندە. هەڵمەت و ڕاکردن، بەپەلەچوونە شووێنێکی.

**فڕاندن:** ڕەواندن، ڕفاندن، ڕەڤاندن. هەڵفڕاندن.

**فڕانفڕان:** مەبەس لە ڕاوو ڕووت و بێ ئارامییە.

**فڕانن:** فڕاندن.

**فراوان:** گوشاد، بەربەرەلاّ، بەربلاّو، فرە، فرەه، گەورە، پۆڕ، پەرەسە. بەراوەلّە، فرەوان، (خۆ.) بەرووەدە، پان و پۆڕ، پان وبەرین. ــ ی دەغلّ ودان: زۆری، گەلێک. زۆر، ئێجگار زۆر، گەلێ. ــ بوون: گوشاد بوون. زۆر بوون. ــ کردن: گوشاد و ئاوەلّە کردن. زۆرو زەبەند بوون. ــ ی: گووڕانی، گوشادی.

**فراوانی دەخلّ ودان:** زۆروزەوەندی.

**فراوین:** (باد.) فراڤین، فرامین، نیوڕۆژ، چێشتی نیوەڕۆیە، نانخوواردنی نیوەڕۆیە.

**فڕ:** ماف، بەندیواری. ــ ی بەسەریەوەنەماوە: مافی بەسەریەوە نەماوە.

**فڕە:** پەرت، توورڕ. ــ دان: توورهەلّدان، فڕێدان. دەرچوون، هەلاّتن. (ڕەوا.) نەکوتراو. فڕەی باڵندان، پڕە، دەنگی باڵی باڵندانە لەکاتی فڕینێدا.

**فرە:** تەنبەلّ، ترسەنۆک، فراوان، گەورە. (کە.، فە.، ئەردە.) زۆر، گەلێک، ئێجگار زۆر، بێ ژمار، بێداد، مشە، مشەمەر، (ئەردە.) بێشو.

**فرەبوش:** چتێکە بەشی زۆرانی تێدابێ یا زۆر بەشبەش بێ.

**فرەبوون:** فراوان وگوشاد بوون.

**فرەبێژ:** زۆربلّێ، سازندە.

**فرەجار:** زۆرجار، فرەکەش، چەندجار، چەنجار.

**فرەخەیاڵ:** کەسێکە ئاوات ومرازی زۆربێ.

**فرەخۆر:** زۆرخۆر. ــ ی: زۆر خۆری.

**فڕەدان** (ئەردە.): فڕێدان، توورهەلّدان.

**فرەڕوو:** دوو ڕوو. ــ یی: دووڕوویی.

**فرەز** (باک.): مەخمەر، قەدیفە.

**فرەزان** (زمن.): زۆرزان، پڕ. ـــ ی: زۆرزانی.

**فرەزانا**: زۆرزان، پڕ. ـــ یی: زۆرزانایی.

**فڕەفڕ**: ـــ ی باڵی باڵندان، دەنگی لێکدانی باڵی باڵندانە لەکاتی فڕینیدا، پڕەپڕ، (باک.) ڕەف.

**فرەکردن**: ڕاکردن، دەرچوون وتێپەڕینی گیاندار. دا فڕەیەکی بکە بکە بازاڕی. زۆرکردن.

**فرەکرن** (باد.): فرەکردن.

**فرەگەڕ**: زۆرگەڕ، هەڵەگەڕ، گەڕا، وێڵگەڕ.

**فرەگوشاد**: زۆرگوشاد.

**فرەگێڵ** (هەورا.): زۆرگەڕ.

**فرەماگ**: چتی کۆن، کۆنە، (ئەردە.) پەزیرە.

**فڕەنگ**: فەرەنگ، فەرانسەیی.

**فڕەنگی** (باک.): تەماتە. کفتی، سفلیسی.

**فرەواچ** (هەورا.): زۆربڵێ، چەنەباز، چەنەدرێژ.

**فرەواچی** (هەورا.): زۆربڵێیی.

**فرەوان**: گوشاد، ڕایی، ڕاهی، فراوان. ـــ ی: گوشادی. زۆری.

**فرەوەر**: زۆرخۆر.

**فرەوەڕ**: مەبەس لەمەردومی سازندە، سەگی هەڵەپاس.

**فرەیی**: زۆری چت، مشەیی، فراوانی، مشەڕی بێشۆیی.

**فڕپێوە**: ماف پێوە. فڕی پێوەنەماوە: مافی بەسەریەوە نەماوە.

**فرت**: باز، ـــ دان: بازدان، قەڵەمبازدان. بۆڵە، بۆڵەبۆل، فلە، جوولە، بزۆزی.

**فرتاندن**: دەرهێنان، بۆڵەکردن، پرتاندن، فلتاندن، دەریەڕاندنی چت.

**فرتانن**: فرتاندن، دافرتاندن، فڕێدان.

**فرتە** (کە.): پرتەی چرا، جووڵەوبزوتنەوەی یەک لەدووای یەک، پرتە. بەرەلا، دەرباز. ـــ بوون: بەرەلابوون. ـــ کردن: بەرەلاکردن، دەربەڕینی چتێک لە چتێکی تر بە تەووژم.

**فرتەفرت**: بۆڵەبۆل، قرتەقرت، پرتەپرت، تەپەتەپە.

**فرتفرت** (باک.): فرتەفرت، بۆڵەبۆل، قرتەقرت.

**فرتک**: تفنک، کونەلووت، هێڵنج.

**فرتکە** (سوور.): (موک.) فڕکە، باڵندەکە ـــ ی کرد و ڕۆیشت، مرۆیەکە ـــ ی کرد و ڕۆیشت: هێزی دا خۆی و ڕۆیی.

**فرتوونەک**: (زا.) فەرتەنەی دەریا و زری.

**فرت و هۆڕ**: فرتەفرتی زۆر.

**فرتێنە**: فەرتەنە، تۆفان.

**فرجیل**: دانەوێڵەی نیوە کولاو.

**فرچە**: فلچە، پرچۆک، (باک.) پرچە، قەڵەمی موویین.

**فرچەفرچ**: فلچەفلچ.

**فرچەکردن**: (باک.) فرچەکرن، فلچەلیدان، پاککردنەوە بە فلچە.

**فرچەلێدان**: فلچەلیدان، پاککردنەوە.

**فرچک**: خوو بە چتێکەوە گرتن لەسەردەمی شیرخوارنیەوە، دەڵێن ـــ ی پێوە گرتووە. هەوەڵخواردنی منداڵ و بێچووی ساوایە لەمەمک و گووانی دایکیان، ژەک، (باک.) فرسک، فریشک، بۆ منداڵ و فەرخەی ئاژاڵ و وولاخان مەبەس لە شیرخواردنییە. ـــ کردن: شیر دەرخوارددان. ـــ کەوتنی منداڵ: سەر ڕانی شل دەبێ و زگی دەچی نێوانی ڕانی زگی شل دەبێ دەڵێن ـــ ی کەوتووە دووایە دەیهێننەوە، زکچوونیش نیشانەیەتی.

**فرچۆک** (باک.): قەڵەمی موو.

**فرچیل**: دانەوێڵەیەکە نیوەکوڵ بووبێ، نۆکەکە ـــ بووە.

**فرخ فرخ**: فیچقە دەنگی پژانی خوێنی کوژراو و سەربڕاوانە.

**فرد** (باک.): شۆرباو.

**فرداندن** (باک.): ووردکردن.

**فردەک** (باک.): وورد. ـــ کرن: ووردکردن.

**فردک** (باک.): فردۆقی

**فردۆقی** (باک.): تێکوشیوی نان و دۆ، فردک.

**فردۆک** (بار.): باپشکێو.

**فردین** (باک.): ووردبوون، بفردە (ووردبە).

**فرز** (ئەردە.): زوو، گورج، توند، تیژ، چەسپان، پەلە، کرژ، توند و تیژ.

**فرزەن**: فرزەند.

**فرزەند**: منداڵ، ڕۆڵە، بەچکە.

**فرژین** (زا.): پرمەی وولاخ.

**فرس**: هەرێژ.

**فرسادە**: فرستادە، ناردراو، ناریاگ، هەناریاگ، دەسپێریاگ. ناردراو، کەسێکە لەلایەن یەکێکەوە ناردرابێ بۆلای یەکێکی تر بۆ گەیاندنی ڕاسپاردەیەک. ناردراو.

**فرسەخ**: فرسەنگ، فرسەق.

**فرسەخ ژمێر**: فرسەنگ ژمار.

**فرسەخ نووین**: فرسەنگ نووێن.

**فرسەق**: فرسەنگ، فرسەخ ٨ کیلۆمەترە کە دەکاتە ٢ میل بەرانبەری دووازدەهەزار گەزییە.

**فرسەق ژمار**: فرسەنگ ژمێرە نیشانەیێکە لەسەر ڕێگایانی دادەنێن.

**فرسەنگ ژمار**: فرسەخ ژمێر.

**فرسەنگ نووێن**: فرسەخ نووێن.

**فرستقاندن** (باک.): زەوتکردن.

**فرستقین**: زەوتکران، گیران.

**فرسک** (باک.): هەوێن (بۆ پەنیری). فرچک.

**فرش** (باد.): هەوێنی پەنیری، شیلاووک، شیلک، ژیلک.

**فرشە**: فلچە.

**فرشتە**: فریشتە، مەلائیکە، بەندەی خووا، نێوی ئافرەتانە.

**فرشک** (باک.، کە.): شیلاووک، پایەدار، مشوار، بێ ـــ: ناپایدار، بێ مشوار، بێ ـــ ی: ناپایەداری، بێ مشواری.

**فرفات** (زا.): کاڵای دراوی هەڵاهەڵا.

**فرفجووک** (کۆ.): فرووجکردن.

**فرفرە:** بافرە، پەروانە، فرفرۆک، کڕک، گفگفە، گیڤگیڤە، تەختەیێکی ناسکە لـە دەزووی قـایم دەکـەن و بـایدەدەن. فرفرۆکـە. شەقشـەقە، دوو تەختەی چووار گۆشەیە لـە دەزووی قـایم دەکـەن تەختـەی سـەرەوە دەپێچن دەزووەکەی دەکێشی و دەنگی لێـوە دێ. نێرگەلـە. مرازێکی ئازاردانـە لـە قامکان دەکرێت.

**فرفرەک** (باد.): فرۆکە، باڵافر، باڵوون.

**فرفرۆک:** فرفرۆکە، فرفرە.

**فرفرۆکە:** فرفرۆک، کڕک، پەروانە، بادەوە، لە قاقەز وەکوو چەند قاپووچکێکی دروستدەکرێ بای لێدا دەسوورێ.

**فرفک** (باک.): پەپوولە.

**فرفینگ** (زرا.): هەڵامەت، پەسیو.

**فرک** (باک.): کشتوکاڵی بڵاو. فرەک، قومێک لە ئاو و شلەمەنی.

**فرکەفرکا:** ڕاکردنی مرۆڤانە لـە ترسان لـە کـاتی تێکچوونی ئـارامی و ئاسایشیدا.

**فرکان:** فرکە، بەفرکانێک بچۆ بۆ باغی.

**فرکاندن** (ڕۆژ.): فراندن.

**فرکانفرکان:** فرانفران.

**فرکە:** بەفرکە، بەتاڵووکە، بەپەلـە. ـــ ی کرد: بۆ مرۆڤان: تیژتێپەڕیی بـۆ هەموو زیندەوارێکی دەبێ، بە واتا هێزیدا بـەخۆی و ڕۆیشت و دەرپەڕی. (باک.، بابا.) بازرقـە، فیچقـە، خوێـن فیچقەی بەست. خوێـن ـــ ی بەست: خوێن بازرقەی بەسـت. فچـووق، فچـووز، (سـوور.) فرتکـە. باڵندەکە ـــ ی کرد واتە باڵی لێکدا و فری و ڕۆیشت.

**فرکەت** (باک.): دار و درەختی بێ درەخت.

**فرکەفرک:** فرکەی یەک لەدووای یەکتری.

**فرکبوون:** زانی ماین.

**فرکردن** (ڕەوا.): هەڵقوڕاندن، فردان.

**فرکرن** (زا.): فرکردن، قومدان لە ئاو و شلەمەنی، قـوم لێـدان لـە چـتی ڕوون وەکوو ئاو و ماستاو و دۆ و شۆربا و دۆشاو و ئیتر.

**فرک و هۆڕ:** گـیز و هـۆڕی بـەرد و گوللـە و پـلـلاری هـاوێژراو، هـات و چۆکردنی زۆر بەفرکە، فرکە فرکی زۆر.

**فرگـە:** جێگـەی فڕیـن، فڕۆکەخانـە. (ئـەردە.) جێگـای دەربـازبوون و دەرچوون.

**فرلداخ:** فیل، فروفیل، پلان، پیلان، گێچەڵ، تەشقەڵە. ـــ باز: فێڵبـاز. ـــ ی: فێلبازی. ـــ چی: فێڵباز. ـــ چێتی: فێڵبازێتی.

**فرمان:** ئیش و کار، هەرمان.

**فرمانکەر:** کارکەر، هەرمانکە، فەرمانکار.

**فرماندن:** فرمەفرم کردن، پرماندن.

**فرمانکردن:** کارکردن، هەرمانکردن.

**فرمانگوزار:** کەسێکە بەردەستییت بکات. ـــ ی: بەردەستێتی کردن.

**فرمە:** پرمەی وولاخی بەرزەیە لەغاردانێدا. ـــ کردن: فرماندن.

**فرمـەفرم:** فرمـاندنی وولاخی بەرزەیە، پرمـاندنی وولاخـی بەرزەیـە لـە غاردانێدا. ـــ کردن: پرماندن.

**فرمێسک:** هەرسی، (هەورا.) هـەس، ڕۆنـدک، (باک.، باد.) ڕۆنتـک، هۆرمیـس، هێسـتر، ڕنـدک، (زەن.) ئەسـر، (بـاد.، دەر.) ئەسـتێر، (مـوک.) ئەسرین، (هەر.) ڕۆنـک، (هـەورا.) هەرەس، دڵۆپـە و تکـەی ئاوی چاو.

**فرمێسک ئاگر:** خوێناو، هووناو.

**فرمێسک بزە:** نێوی پەرتووکێکی کوردییە. زەردەخەنەیە بەدەم گریانەوە، گریانێکە بەدەم خۆشی و لە خۆشییەوە بێ.

**فرمێسک هەڵوەراندن:** گریان بەکوڵ.

**فرن:** (باک.) فرنە، تەنوور، تەندوور، کوورەی نان برژاندنێ.

**فرنە** (باک.): فرن، تەندوور.

**فرنەگولە:** فیسقەگولە، فیرنەگولە.

**فرنـدە:** پـەرندە، مـەلـەوەر، بـاڵنـدە بـاڵدار، پەلـەوەر، بـاڵندەییێکی زۆر گچکەیە.

**فرنک** (باک.): تفنگ، کونەلووت.

**فرنی:** خواردەمەنیە کە لـەشەکر و برنجی هاڕراو و شیردروست دەکرێ. کوورەی نان برژاندنی نانەوایانە.

**فرۆ:** ووشکە فـرۆ، فری، (باد.) فروو، ژەکی کـوڵاوی توندبووەوە. ـــ ی توند: کـەرەفرۆ، ـــ ی شل: لێـوە، چتێکـە وەکوو ماست لـەزکی ئـاژاڵ و ماڵاتی تازە زاو دەمەیەنرێت و بێ هەوێنە واتە کەژەکە، کە گەرم بوو بە بێ هەوێن لە پاش سادربوونەوەی وەک ماست دەمەیێ.

**فرۆ:** گەروو.

**فرۆتـەنی:** فرۆشـتـەنی، کـەل و پـەل و چتی فرۆشتنێ. خۆبەکەم نوانـدن، خۆنزم و گچکە گرتن.

**فرۆتن:** فرۆشتن.

**فرۆخت:** برەو ڕەواجی چت لـە فرۆشتنا.

**فـرۆش:** فرۆخـت، فرۆشـەر، فرۆشـیار. کـار فـرۆت، کارفرۆشـی. بـرەو لـە فرۆتندا؛ ئەسپ ـــ ی نیە.

**فرۆشتەمەنی:** کەل و پەلی فرۆشتنێ.

**فرۆشتەنی:** فرۆتەنی.

**فرۆشتن:** فرۆتن.

**فرۆشیار:** کارفرۆش، فرۆشەر، بفرۆش، کەسێکە چتمەکی بفرۆشێ. ـــ ی: کارفرۆشی، فرۆشەری، بفرۆشی.

**فرۆک** (باک.): لـەبەردلان، گیانسووک.

**فرۆک:** فرۆکە.

**فرۆکە:** باڵافر، باڵوون، پقۆک.

**فرۆکەچی:** باڵافرچی.

**فرۆکەچێتی:** باڵافرچێتی.

**فرۆکەخانە:** باڵافرخانە.

**فرۆکەشکێن:** چەکێکە فرۆکەی پێ بشکێ.

**فرۆکەوان:** باڵافروان، کەسێکە فرۆکەی بازۆوێ. ـــ ی: باڵافروانی.

**فڕۆکەی بۆمباهاوێژ:** بالآفڕی بۆمباهاوێژ.

**فڕۆکەی پڕپیاکەر:** بالآفڕی پیرپێلەکار.

**فڕۆکەی تفاق گوویزەوە:** بالآفڕی تفاق گوویزەرەوە.

**فڕۆکەی سووسە:** بالآفڕی سووسە، فڕۆکەی سەرنجدەر.

**فڕۆکەی قەلآیی:** بالآفڕی زۆر زەلام.

**فڕوو:** فڕۆ.

**فڕووج:** جوجکەی مریشکی نێرە لەپاش تەمەنی (٥) مانگی تا دەگاتە ساڵێکی تەواو، ڤارک، (باد.) وارک، لە هێندێک شوێنان دەڵێن بارۆکەیێکە هێشتا هێلکەی نەکردبێ هەڵەیە.

**فڕووجاو:** شۆربای فڕووجی.

**فڕووجکردنەوە:** (کۆ.) فڕفجووتکردن، بەفڕین خۆفڕێدان بۆ نێو هەوا یا ئاو بۆ هەموویان لەبەرێکی بەکاردەبرێت کە بە پەلە خۆی باوێژێتە ناو هەرچتێکییەوە.

**فڕووز:** وەرزی، جاڕسی.

**فڕووزوو** (باد.): هەرێز.

**فڕووزی** (زا.): چتی چکۆڵە.

**فڕوفێڵ:** کون و کاژێر، پێچ و پەنا، کون و کەلێن، (بۆڵی.) تیتاڵ، فێڵ و فەرەج، چاپ و چووپ. ـــ کردن: چاپ و چووپکردن.

**فڕووکە:** دەستەچیلە.

**فڕووکەر** (باک.): نەفس، گیان.

**فڕوون:** فڕن.

**فڕوهوور:** فرەفڕی زۆر.

**فڕێت:** بەنێکی ئەستوورە بۆ ڕایەڵی تەونی بەکاردەبرێ.

**فڕێتە** (ڕەوا.): دوولوی داوە بەنیە باش با نادرێ خاوەپەشتیشی پێدەڵێن خاوەپەشت لە ڕایەڵدا بەکاردەبرێ، فڕێت.

**فڕێتوون** (باد.): جوورە شیرینییەکە، کە لە ئارد و هێلکە و شەکر دروست دەکرێ وەکوو پەنجەرە کونکونە.

**فڕێدان:** ئاوێژتن، (باک.، باد.) ئاڤێتن، کەوژاندن، کەوشاندن، ڤەزەلاندن، دەراڤێتن، ڕادان، (زەن.) پەردان، گەپچاندن، توورهەڵدان، توورپدان، تێهەڵدان، دوور خستنەوەی چتێک لە خۆت بە ئاوێژتن. لێ ـــ: لێکردنەوە، پەڕاندن.

**فڕێز:** پەرێز، جاری کشت و کاڵی دروواوەوە. (باک.) جوورە کرێکی وەکوو تەدیفەیە.

**فڕێزە** (باک.): مەزرای کشتوکاڵ لێ بڕاوەوەیە، دروێنەکرابێ، فرێز، پەرێز.

**فڕێن:** کلاوفڕێن، کەسێکە چتی بڕفێنی یا باڵندەی هەڵفڕێنێ، هەڵفڕێن.

**فڕێوە** (هەورا.): گەلێک.

**فریا:** چەپاڵە، هانا، داد، هاوار. ـــ کەوتن، چەپاڵەدان، بەهاناگەیشتن، بەهاوارەوەهاتن.

**فریاد:** فەریاد.

**فریاخستن:** گەیاندنی چتێک بە کەسێک لەکاتێکی زۆر پێویستدا.

**فریاڕەس:** کەسێکە بەهاواری کەسێکییەوە بگات، دادڕەس.

**فریاکەوتن:** بەهاناگەیشتن، بەهاواری کەسێکی گەیشتن.

**فریاگەییشتن:** بەهاناگەیشتن، بەدادگەییشتن.

**فریال** (باک.): ناوی ئافرەتانە.

**فریب:** فریو، گوڵ، خڵەت، خڵەتە.

**فریبدن:** هەڵخەڵەتان، تەفرەخواردن.

**فریب خۆر:** کەسێکە فریوی خواردبێ.

**فریب خواردن:** هەڵفریوان.

**فریبدان:** هەڵخەڵەتاندن، فریودان، گوڵدان، خەڵەتاندن.

**فریبدەر:** هەڵخەڵەتێن، فریودەر، گوڵدەر، ڕەنگ کەر، لەخشتەبەر، لەڕێگەدەربەر.

**فریبیاگ** (ئەردە.): هەڵخەڵەتاو، گوڵخوواردگ، ڕەنگ کریاگ، فریویاگ.

**فریز** (جەبا.، باد.): جوورە دەنگێکی درێژە لە نێوانی دز و ڕێبووارانەدا یەکتری پێ ئاگادار دەکەنەوە. فریزوو.

**فریزوو:** (جەبا.، باد.) فریز، (فە.) هرێز، (ڕۆژ.) چایەر، هەرز، هەرێس. ـــ ڕنینەوە: لێدان، کوژتن.

**فریسم** (مام.): دۆعا خوێندن. دۆعایەکی لێ ـــ کردن: دۆعا بەسەردا خوێندن.

**فریشتە:** گۆیا بەندەی تایبەتی خودان، پەری. بەخت، ڕاو، چارەنووس.

**فریشتەی ماریی:** فریشتەی بەخت، چارەنووس.

**فریشک:** فرچکی منداڵی ساوا. پایەدار، خۆڕاگر، بێ ـــ: ناپایەدار، چوارپینە. (کە.) شیلاووک، ژەکێکە لەزکی کار و بەرخ دەرهێنرابێ بۆ هەوێنی پەنیری خۆشکرابێ، مایە.

**فری فری:** جوورە گەمەیەکە چەند کەسێک پێکەوەی دەکەن، یەکێکیان دەبێتە وەستا و دەڵێ فری فری فیسارە چت فری و قامکی بەرز دەکاتەوە ئەوجار ئەگەر چتێکی وای کوت کە فرندە بێ ئەوی لەگەڵ وی قامکی بەرزنەکاتەوە تێدەکەوێ و ئەگەر چتێکی واشی کوت کە فرندەنەبێ ئەوی لەگەڵ وی پەنجەی بەرزکاتەوە تێدەکەوێ.

**فریک** (باک.): فەریک.

**فرین:** پەرواز کردن، فران، فریان، باڵگرتنی باڵدارە بۆ حەوا، هەڵفڕین. لێدانی دەمار.

**فریو:** تەفرە، دەستخەڕۆ، بڵحات، فریب، خشتە، فێڵ، لەپۆکی، تاو، چاغ و بەنگ، خاپ. ـــ دان: لەخشتەبردن، دەستخەڕۆکردن.

**فریوە:** گەمەیەکە ئەوی تێکەوێ دەبێ بە هەنگڵە شەلە بڕوات و ئەوانی دی تێی هەڵدەدەن ئەویش لەوان هەڵبدا ئەوجار هەرکەسێ وە بەر شەقی وی کەوێ تێدەکەوێ.

**فریوان:** فریوخوواردن، هەڵفریوان.

**فریوباز:** خاپۆ، خاپۆک، فێڵباز، (کە.) بەزاچ، فریودەر، لەخشتەبەر، زانەخڕۆ، سەمەندەکرۆژ، قۆڵشکێن، دەست شکێن، خاپینۆک. ـــ ی: تەفرەدەری.

**فریوخۆر:** تەفرەخوواردوو. ـــ ی: هەڵخەڵەتان.

**فریوخوواردن:** فریودراندن، قۆڵشکان، دەست بڕان، خەڵەتان، چاخ و بەنگ خارن، خاپیان، فریوان، هەڵفریوان.
**فریودان:** تەفرەدان، هەڵخەڵەتاندن، خاپاندن، لەخشتەبردن، چاغ و بەنگ کرن، قۆڵشکاندن، چاوبەستن، تاودان، لەپاندن، زەباندن.
**فریودەر:** خەڵەتێن، هەڵخەڵەتێن،، (کە.) بەزاج، فریوباز، زەوتەک، فێڵباز، تەفرەدەر، سەمەندەکرۆژ، خەپۆ، لەبۆک، فریوبەر، هەڵفریوێن.
**فریویاگ** (ئەردە.): هەڵخەڵەتاو.
**فریویان** (ئەردە.): هەڵخەڵەتاو.
**فز:** فزە، هەست، فس، (ئەردە.) فسە.
**فزە:** فز، جووڵە، نکە، نقە، هەست. ـــ نەکەی: واتە نەجووڵێی. نووکە، لچ جووڵیانەوە، نق.
**فزدووک:** عازەبی.
**فززە:** هەست، جووڵە. ـــ کردن: جووڵان. ـــ لێوەهاتن: جووڵانن، دەنگ کردن. دەنگی بای، هاش.
**فززەفزز:** هاشەهاش، دەنگی بای.
**فززەلێ بڕین:** مەبەس لە جووڵە خستنی یەکێکییە.
**فردۆک** (بار.): باپشکێوە.
**فس:** تس، بای بێ دەنگ کە لە مرۆی جووێ دەبێتەوە و بۆگەنە. ـــ کەندن: تسکەندن. بڕوانە: فسسە، قوندانەوە و هەڵنیشتنی مریشک و باڵندانە.
**فساندن** (باک.): کوورکردنەوە، چەماندنەوە، داهێناندنەوە، قەڵەشتن. (موک.) تس پێکەندن، تساندن. (باک.) نیشتاندنەوەی هەلاّمسانێ.
**فسە:** چپە. ختە، ختتە.
**فسسە:** ختە، ختتە، فس، بۆ دەرکردن و ڕاونانی پشیلە بەکار دەبرێ.
**فسەزمان** (دزە.): پسک، زمان پسک، لاڵەپەتە، زمان پس.
**فس فس:** چپەچپ.
**فسەک** (باک.): فسکەن، تسکەن.
**فسەکردن:** چپەکردن، خفتەکردن.
**فسەگورگ** (خۆ.): خاڵخاڵۆکە.
**فسەگورگانە:** تسەگورگانە، کیرە سەیانە، گیایەکی پاییزییە وەک کارگ لە زەوی دەردێ بەقەد دوومەلاّنێکی دەبێ بە ووشکی نێوەکەی وەکوو ئاردی بەمبای لێدێ بەبرینی وولاّخی وەرکرێ چاکی دەکاتەوە.
**فسەی فس:** سرتەسرت، (کۆ.) فسکەفسک، (هەورا.) شیلانی مووروو.
**فستان:** جوورە عەزیزییەکی ئافرەتانە ئاودامانی ناو قەد باریکی داوێن والاّیە.
**فستق:** فندق، بەری درەختێکییە وەکوو پستە بەسوێر کراوی دەخورێ.
**فستک** (زا.): کەسێکە کە لە ڕۆیشتنێدا پێی هەڵخلیسکێ.
**فستۆق** (دزە.): دابین کەر. (باک.) گەمەیەکی مندالاّنەیە بەدار دەستێکی چتێکی توورِ هەڵدەدەن بە لێدانی. ـــ ی: کەسێکە هێندە گەرۆک بێ نەکەوێتەوە ماڵی خۆی. سەگی خوویڕی.
**فسدان:** بڕێتییە لە دەرکردنی یەکێک، بارامیان فسدا: واتە دەریانکرد، خۆدانەواندن، خۆفشکردنی مریشک بۆ کەڵەشێر.
**فسدانەوە:** دەست هەڵگرتن لە کارێکی و پەشیمان بوونەوە لەبەر نەبوون و سەرنەگرتنی، تسکەندن.
**فسس:** ووشەیەکە پشیلەی پێ دەردەکرێ.
**فسسە:** فسس.
**فسفس پاڵەوان:** بڕێتییە لە یەکێک کە هیچی لە دەست نەیەت و هەر خۆشی هەڵکێشێ.
**فسفسک** (باک.): گیایەکی بۆن ناخۆشە.
**فسفسۆک:** (باک.)فسفسک.
**فسقە** (کە.): فیسکە، (بابا.) فیسقە: قیسکەپیواز، فسکە، سەلکی پیوازی وورد بۆ تۆو هەڵدەگیرێت.
**فسقە:** فسکە.
**فسکاگوری** (باک.): فسفسۆک، جوورەگیایەکە.
**فسکاندن** (باک.): تساندن.
**فسکە** (کۆ.): سرتە. پیوازی فسقە، فیسکە.
**فسکەر** (باک.): تسکەن.
**فسکەفسک** (کۆ.): سرتەسرت.
**فسکەن:** تسن.
**فسکلک** (هەو.): مریشک یا کەڵەبابێکە کە کلکی ڕووبەرە و خوواربێ.
**فسکوول:** گوڵنکی فێستی سوورە.
**فسکین** (زا.): پێ هەڵخلیسکان.
**فسن:** تسن، فسۆک.
**فسنان:** مەبەس لەدەرکردنی یەکێکییە.
**فسۆس:** فسکەن، تسکەن، گەندەدەڵەک. حیز، تەپ، تەنبەڵ. (هەورا.) بۆگەنکە، داعبایەکە بە قەدەر دەڵەکێکییە کلکی گەزێک درێژە دەست و لاقی زۆر کورتە گۆشتی ناخورێ هێندێکیش دەڵێن لە پشیلەی گچکەترە.
**فسیان** (باک.): کوورِ بوونەوە، چەمانەوە، فسین.
**فسین:** فسیان، تسکەندن، تسین.
**فش:** ڤل، ماندوو، خاو. ـــ بوونەوە: خاوبوونەوە. ـــ پێ کردن: ـــ پێکردنەوە. کەپۆی ـــ: تفنک زل و فراوان، بەدەنگی لووت ئەستڕینێش دەڵێن، بەدەنگی ماریش دەڵێن. بە پێچەوانەی چەسپ، جلی فش: جلی فراوان، دەرپێی فش. (کە.) بۆ چتێکی پتەودەبێ کە یەکتری بەردابێ. لۆکەی ـــ: لۆکەی کراوەوە. زەوی ـــ: زەویەکە نەنیشێتە سەر یەکتری. (باک.) ڤووڵ، گەوج، بەتاڵ. (زا.) چڵمی لووت، فم. ـــ کرن: فم کردن، چڵم ئەستڕین. (هەورا.) فیز، بەخۆی دەفشێ: بەفیزە.
**فشارای** (هەورا.): کوشین.
**فشە:** دەنگی فیشەکی نەورۆزان و شادمانی، فیشە. گەمە، لاف، فیشاڵ، گاڵتە، گەپ، یاری، زڕتەک، زڕتۆڵە، بە ـــ ڕای مەبووێرە. جوورە دەنگێکە وەک دەنگی تسی وایە.
**فشەفش** (کە.): ـــ کردنەوە: بە کەسێکی هەڵکوتن. دەنگی لووتییە، بۆدەنگی چتێکیش بەکاردەبرێ بەدەم باو هەواوەی. فشەی یەک لە دووای یەکتری.

**فشەکردن:** بریتییە لە خۆ هەڵکێشان، گاڵتە و گەپکردن. دەرچوونی دەنگ بە فشەوە لە چتێک.

**فشەکلاوتە** (هەورا.): چوورە پۆپنە، چنگەڵە، شووان هەڵخەڵەتێنە، شووانخەڵەتێنە، باڵندەیێکە لە چۆلەکە گەورەترە بۆرکار و کلاوونە (پۆپنە)، بەزۆری لەسەر رێگایان دەنیشێ و هەڵدەفرێتەوە زۆر ناپوات و دەنیشێتەوە گۆشتی دەخورێت.

**فشەڵ:** فشۆڵ، زەوی خاوو خاک رزیو، (کە.) سستەک، بۆ هەموو چتێکی فشۆڵ بەکار دەبرێ.

**فشەوەبوون** (کە.): لە خۆبایی بوون.

**فش بوون:** هوڵۆڵبوونی چت. نەرم بوون و هاتنەباری یەکێک لە کارێکیدا لەمەو پێش نەیویستبێ بیکا. دەرچوونی با لە تایەی ئۆتۆمۆبیل و نیتر.

**فشتاق** (باد.): (خۆ.) فیسقە، فیچقەی ئاوێ.

**فشتخاندن** (باک.): هەڵخلیسکاندن.

**فشتخین** (باک.): هەڵخلیسکان.

**فشفشە** (باک.): مرۆ و گیانداری ئەستوورن و گەورەن. بەدەنگی ماریش دەڵێن.

**فشقیات:** گەمە، گاڵتە، گەپ، فیشقیات.

**فشک** (باک.): فاتەرەشک.

**فش کردن:** برێتییە لەنەرم بوون و هاتنەبار بۆ کردنی کارێک.

**فش کردنەوە** (کە.): هەڵنان، بەکەسێکی هەڵکوتن.

**فشکین** (باک.): دەنگی لووتە، (باک.) پشکین.

**فشۆڵ:** فشەڵ.

**فش و فۆڵ:** چتی فشی شل و شێواو، سست، نەرم، فش.

**فشی:** پۆزایی.

**فشیان:** فشین.

**فشیای:** دارِسانی خووێنی لووت.

**فشین** (هەورا.): دارِسانی خووێنی لووت. (باک.) نیشتنەوەی شووێنی هەڵامساو و ئاوساو. (موک.) شانازی. بەخۆ ــ : شانازی کردن.

**فکڵە** (هەورا.): کاکۆڵ، تووالێت. نێوچاوان، چالآیی پشت مل.

**فل:** سس، پەخمە، شل و وول، فش، ماندوو، خاو، شل، شەکەت، سست، شل و شێوا و تەمبەڵ. ــ بوون. ــ کردن.

**فلار** (رەوا.): جندە، سووزمانی.

**فلە:** فەلە.

**فلەە** (باک.): فەلە، دیان.

**فلەهن:** جوورە ماسییە.

**فلەهی** (باک.): فەلەیی، زمانی فەلان.

**فڵت** (کە.): بلاو، فش، فراوان، دەڵب. قەڵەوی ئەستوور.

**فڵتاندن:** فرتاندن، بۆسووکی، بۆکەسێک بەکاردەبرێ، کە با خووی، گوفتوگۆ کردن بە فڵتە.

**فڵتە:** دەنگێکی سەیرە لەدەم و لێوی هەندێ کەسەوە دێ لەکاتی گفت و گۆدا، قسە لە باری سووکیدا بەکاردەبرێت، بۆڵە، هەرِشە، گەزارە، ووتەی بێ رێ و جێ، دەنگی ئاخۆتنی پیران.

**فڵتەفڵت:** بۆڵەبۆڵ، فرتەفرت، فلقەفلق، ناماقووڵی، پرتەپرت، فڵتەی یەک لە دووای یەکتری، کاوێژ، فڵچەفڵچ.

**فڵتەدەمە:** کەسێکە لە گوفتوگۆیەدا هەر فڵتەی بێ.

**فڵچ:** پان. ــ بوونەوە: پان بوونەوە. ــ کردنەوە: پانکردنەوە.

**فڵچە:** چتێکی موویینی زبرە دەم و ددانی پێ دەشۆرێ و هی گەورەش پێڵاو کالآی پێ پاک دەکرێتەوە، بەتارە، گزکەچە. جوورە دەنگێکە لە پێڵاوەوە دێ لەکاتێکا، کە ناوەکەی تەربێ. فڵچە، مژین، هەڵمژین، دەنگی هەڵمژین. فڵتە.

**فڵچەفڵچ:** فڵچەی یەک لەدووای یەکتری.

**فڵچەی تۆزتەکاندنی:** (هەورا.)فڵچۆتۆزتەکنای.

**فڵچ و هۆڕ:** فڵتە، فڵچەفڵچی زۆر.

**فلس:** دراوێکی مسینی کەم نرخی گەرمێنییە.

**فلفل:** مەیموون.

**فڵق:** ناوی کەمترین دراوێکی بابانییە. ئافرەتێکە زۆر بەکاربرابێ، (باک.، باد.) فەلگێ. (کە.) دەڵب، زۆر گوشاد و فراوان، زل، کەوشەکەم بە پێم فڵقە.

**فڵقە:** فڵتە. قوڵتە. جوورە دەنگێکە وەک دەنگی کاڵەکی باڵ، کە بدرێ بە زەویدا.

**فڵقەفڵق** (کە.): قوڵتەقوڵت. (کە.) فڵتەفڵت، ووشەیەکە لە رووی سووکییەوە دەکوترێ بە یەکێک، کە قسە بکات تا بێ دەنگ بێ.

**فڵقن:** بروانە: فڵقنە.

**فڵقنە:** فڵقن، مێ بینەیەکە جارجارە دەنگ لەزێیەوە بێ.

**فڵق وهۆڕ:** فڵقەفڵقی زۆر.

**فڵقێ:** فڵقن.

**فلۆقە** (باک.): کەشتی گچکە.

**فلووت:** شمشاڵ، بلوێر.

**فلووفا:** کەڵکەڵە.

**فلووفاو:** کەڵکەڵە.

**فلێ** (ئەردە.): نێوی نێرینانە و لە فەرامەرز قوڵە کراوەتەوە.

**فلێتە** (بابا.): سەرسەری.

**فلێقان:** لکی دووپەلی درەخت.

**فلیقان:** فلیقانەوە.

**فلیقانەوە:** مخمخین، (باک.) پەلچقین، مرچقین، پلیشانەوە، پەتشان، (باک.) پرچقان، جیق دەرهاتن، توڵخانەوە، پورخانەوە.

**فلیقاندنەوە:** (زا.، رۆژ.، گژ.) پرچقاندن، هەڵکوشین و چنک تێخستن وەکوو تەماتە، کە هەڵی فلیقێنی، (باک.) مخمخاندن، (دەر.) پلیقاندن، (هەورا.) تلیقاندن، جیق دەرهێنان، توڵخاندنەوە، پورخاندنەوە، پەلاختن، (باک.) پەلچقاندن، پلیشاندنەوەی میوە یا چتێکی تری ناسک و نەرم لە بن چتێکی یا لەژێر پێیاندا.

**فلیقاندن:** فلیقاندن.

**فلیقاننەوە:** فلیقاندنەوە.

**فلیقاو:** فلیقاوەوە.

**فلیقاوه:** فلیقاوەوە.

**فلیقیاگ:** فلیقاوەوە.

**فلیقیان:** فلیقانەوە.

**فلین:** گرژ بوون و هاتنەوەیەک.

**فم:** هنگ. ـــ کردن: هنگ کرن، چڵم نەسترین، کەپۆ خاوێنکردنەوە.

**فم کردن:** هنگ کرن، چڵم نەسترین، کەپۆ خاوێنکردنەوە تیندانە لووت بۆ ئەوەی چڵمێکی کەتێیدایە بێتە دەرێ، لووت سرین.

**فن:** گنە.

**فنەفن:** گنەگن، دەنگی لووتییە.

**فنتۆلی** (باک.): جوورە تفەنگێکی قوڵەیە.

**فنج** (باک.): گاشەبەرد، بەردی گەورە.

**فنجان:** جوورە ئیستیکانێکی کورت و پەلە لە چینی دروست دەکرێ و قاوەی تێدا دەخورێتەوە، فینجان.

**فنجان بر:** جوورێکە لە کاری هەویر، کە بە فینجان دەکرێ.

**فنجانێن:** فینجانێن، جوورە یارییەکە، کە بە فینجان دەکرێ.

**فند** (دزە.): شەمچە، لێ خرێنە، مۆم. (گەرمێن) رستەیەکە لە دەزوو و میوی وەکوو مۆم (شەم.) دەیسووتێنن، لە بەزو شەمیێ دروست دەکرێ هی بەزی دەکەنە مۆم و هی شەمیێ، کە دەکەنە فند، فندک لەناوی ویدا دەزووی بادراوی تێدایە و بە ئاگر دەکرێ.

**فند** (باک.): شەم، مۆم.

**فندشەمال** (باک.): ناوی چیرۆکێکی کرمانجییە.

**فندانک** (باک.): شەمدان، مۆمدان.

**فندەگوله:** فیسقەگولە، باڵندەیەکی گچکەیە، فیرنەگولە.

**فندق** (دزە.): بە هەموو چتێکی چکۆڵە و جووان دەڵێن فندق. (خۆ.) جوورە قۆچەقانیەکە لە کارتەی چناری کەوانەیەکی دروست دەکەن و ژێیەکی دوو قەدی لە هەردووک سەرەکانی قاییم دەکەن پەڕۆیەک یا هەمبانەیەکی لە نێوەڕاستی ژێیەکاندا وەکوو قۆچەقانی لێ دەکەن بێ لاسک هەرسەرەی لە نێوقەدی ژێیەکی دەخەن ئەوسا وورده بەرد یا گرمۆڵەی قوڕی ووشک لە نێوی دەنێن رایدەکێشن و دەیهاوێژن زۆر دوور دەڕوا و زۆر بەهێز و ئەنگێوەیە. (موک.) بەری دارێکییە، (باک.) بندق، وەکوو پستە وایە بە سوێر کراوی دەخورێ.

**فندق شکاندن:** چەقەلێدان، بەقامکی هەردووک دەستان چەقەنەلێدان.

**فندک** (شکا.): شەمچە، لێخرێنە. زەرییەکە لە بۆتانێدا. (باک) مۆم، شەم.

**فنق:** فندق

**فنقچە** (ئەردە.): گۆپکە.

**فنق شکاندن:** مەبەس لە چەقەنەلێدانییە.

**فنک** (ڕەوا.): گندۆرێکە بە ڕەنگ نەبووبێ کە چی ناوەکەی گەیشتبێ. کۆنە شارێکی کوردانە لە مێژوودا ناوی زیندووە و بەشاری قارەمانان ناودەبرێ و قەڵاتێکی سەختیشی تێدایە.

**فنکه:** فینکە.

**فنکەفنک:** فینکەفینک، فینگەفینگ.

**فنووش** (هەو.): کەسێکە لووتی کورتبێ.

**فۆتە:** فۆتک، پێشگیرە، پەشتەماڵ. ـــ ی گەرماوێ: لوونگ.

**فۆتک** (باک.): فۆتە پێشگیرە، سەرپۆشی ژنان.

**فۆدل** (باک.): قنج، قۆز، دەلال، جووان، شیرین، نەخشین.

**فۆڕە** (باک): (باد.) فۆرە. ـــ خووەدان، بەخۆهەڵکوتن، خۆهەڵنان.

**فۆڕت** (باک.): نازین، پەسنی دەرەو، بەدرۆهەڵنان.

**فۆڕتان** (باد.): خۆهەڵکێشان.

**فۆڕتە** (ڕەوا.): بافیش، ساختە، (ڕەوا.) قورزەمە. ـــ چی: بافیشکار، ساختەچی، خۆهەڵکێش.

**فۆڕتەک** (باک.): کەسێکە بە خۆی هەڵبڵێ و بە خۆی بفشێ. ـــ ی: فشاڵ، بەخۆهەڵکوتن.

**فۆقل:** مرۆڤی ڕێک و پێک.

**فۆکۆل:** گەردن بەس، دەسماڵی گەردن.

**فۆڵ:** فش، بەڵان هەمیشە لە دووای (فش) ە وەبەکاردەبرێت: فش و فۆڵ.

**فۆیە:** جوورە دەرمانێکە لە جیوە و هەندێ چتی دیکە دەخرێتە ژێر نقێمی شووشەوە بۆ ئەوەی وەک ئەڵماس بنوێنێ.

**فۆهـ** (ئەردە.) جقجقە، برنجی ناسکە، کە وە قاقمزی تەڵا دەچێ.

**فوتوو:** پەیمان، بڕیاردانی شتێک لەسەر خۆت لە دڵا.*

**فورات:** فەرات.

**فورهە** (باک.): فورات، (باد.) فوورەک، پرژ، سوولی، سوولاف.

**فوو:** (ڕۆژ.، دەر.، باک) پف، (هەورا.) پفوو، بایەکە مرۆڤ بەدەم و لێو لەچتی بکات. ـــ دان: هەتک کردن. ـــ دان: باتێکرن، پفکردن.

**فووارە:** ئاوێکە لە کونێکەوە سەربەرەوژوور هەڵقوڵێ و بە توندی روو لە حەوا بکات.

**فووت:** پووت، بەردێکی تەرازوویە بەرانبەری هەشت سێیانە بۆ کێشانەی دانەوێڵە وەکوو ڕیە، قەسناخ، تەغار. (باک.) فیتوو. ـــ دان: فیتولێدان. دووازدە ئینجە، سی سانتیم و نیوە.

**فووتک** (باک.): فیتووی چکۆڵە.

**فوتوو:** پەیمان، بەڵێنی، بڕیاردانی چتێک لەسەر خۆت لەدڵدا.

**فووتوو:** فیتوو.

**فووچ** (کۆ.): فچ.

**فووودان:** فووکردنە ناوچتێک بەمزۆری، هاتنە دەرەوەی فوو لە چتێکی فوودراو بە هۆی کونبوونییەوە.

**فوورەک** (باد.، باک.): سەخت، تیژ، پرژ و سوولاڤی گچکە.

**فوورهە:** تاڤگەی گچکە.

**فووشەفووش:** لووشەلووش کردنی کەر و ئێستران، بۆ باری سووکێتی بۆ ئافرەتانیش بەکاردەبرێ، لووشەلووش.

**فووکردن:** باتێکردن، پفدان، فوودان، فووکردنە ناوچتێک. هەتک کردن، (باک.) پووخاک.

**فووگرە:** فووکردن لە ئاگر یەک لە دووای یەک بۆ خۆشکردنی.

**فوولەدۆنەکردن:** مەبەس لە نەسڵەمینەوەیە لە کردارێکی گەند و ناڕەوا.

**فوولێکردن:** فووکردن بەدەم لە چتێک.

**فوونک** (باک.): فێنک.

**فونکاهی** (باک.): فێنکایی.

**فوونگەفوونگ:** فینگەفینگی گریانی.

**فهد:** یوز، سەگی ڕاوی.

**فهێت** (باک.): شەرم، ئابروو، فەدی. شوورەیی.

**فهێت بوون:** شەرم کردن، فەهێتکرن.

**فهێتوو** (باک.): شەرمن.

**فێ:** دەردەکۆیانە، شێتی، گشکە، خوو، (باد.) تەپ، پەرکەم، (کۆ.، خۆ.) دەردەکورتان، ئاهۆ. ــ لێ هاتن: خووگرتن، کە لە ئاژاڵ بدات دەڵێن سایە یا سایەڵ لێیداوە، جوورە دەردێکە کوتو پرتووشی هێندێ کس دێ و کەف دەچێنێ و بێهۆش دەبێ. ناوی پیتێکی دەیەمینی ئابێی کوردییە.

**فێخورجۆ** (باک.): ئاشنا، ناوێزە.

**فێدار:** خوودار، کەسێکە فێ بگرێ. ــ ی: خووداری.

**فێر:** فێڵ. ڕام، چەش، چەشە، هیر، هیرا، هین، هۆگر، ڕاهاتوو. ــ بوون: ڕاهاتن، هەڤیسین، چەش بوون، هیربوون، هین بوون. ــ کردن: ڕاهێنان، چەشە و چەش کردن، هیرکردن. پێ ــ بوون: لێ ڕاهاتن. پێ ــ کردن: لێ ڕاهێنان.

**فێرا:** لەگەڵ، پێرا. *

**فێربوون:** لەیادگرتن، خووکردن، ڕاهاتن، هەڤیسین، چەشبوون، هووکارەبوون، (فە.) چارشانین، هین بوون، شارەزابوون، هۆگربوون بە چتێک.

**فێربیەی** (هەورا.): فێربوون.

**فێرز:** ئاڵووکە، پەلە.

**فێرس** (باک.): لێهاتوو، زیرەک، ووریا. لەندەهۆر، بەهێز، پاڵەوان. فێرست.

**فێرست:** پێرست، فێرس.

**فێرکار:** هیرەوان.

**فێرکردن:** ڕاهێنان، هین کردن، شیرکرن، چەش کردن، شارەزاکردن، هۆگرکردن، یاددان، پێ هەڵچنین.

**فێرگە:** شوورێنێکە چتی تێدا فێر ببیت، خوێندنگە.

**فێروو** (کە.): خۆڕایی، فیرۆ، مفتە.

**فێس:** فێست. کڵەوچک. (دزە.) ئاشتی، ئارامی، گونجان، دەفێسێ، نافێسێ.

**فێسان:** گونجان، ڕێک کەوتن. نە ــ : نەگونجان.

**فێساندن:** گونجاندن.

**فێست:** فێس، کۆمسۆر، جوورە کلاوێکی سفتی سووری سوواوەیە.

**فێش** (هەورا.): زۆر، زوریە، فرە.

**فێق** (ئەردە.): چتی لەرو باریک، لەرولاواز.

**فێقاندن:** فیقاندن.

**فێقن:** فێق.

**فێقی** (دزە.، خۆ.): میوە.

**فێگرتن:** فێ لێ هاتن.

**فێل** (باد.): ئامانی دەم پان و پەل. فێلی حیزانە و بێ ئابڕووانە: حیزەفێل.

**فێڵ:** زیچک، گۆبەن، گۆبەند، لیپ، پیلان، پلان، فرلداخ، خاپ، بەدیل، (باک.) بلمات، ئارداف، تەشقەڵە، داو، تەڵە، فریو، ساچمە، تەون و بست، تەڵەکەبازی، ئەروەند، (باک.) گزە، (شا.، هەورا.) گزیی، گەڕ، چەپەندازی، دەهۆ، فەن، فەند، کەلەک، داو. ــ کردن: لەخشتەبردن، تەپ پێکرن، خاپاندن، قۆڵشکاندن. ــ لێ کران: تەفرە خواردن، خاپیان. (ئەردە.) فیل.

**فێڵاوی:** فێڵباز.

**فێڵەزان:** ڕیپۆ، ڕیپۆکەر، ساختەچی، تەشقەڵەباز، فێڵباز، چقۆ، تەپۆ، تەپکەر، خاپۆک، (باک.) خەپۆ، چەپەنداز، گزەوون، فێلزان. ــ ی: سمەندەکرۆژی سا.

**فێڵەگێجە:** فیلەگێژ.

**فێڵبا:** فیلپایە.

**فێڵباز:** فێڵەزان، ڕیپۆ، ڕیپۆکەر، ساختەچی، تەشقەڵەباز، چقۆ، تەپۆ، تەپکەر، خەپۆ، خەپکەر، (باک.) خەپۆک، چەپەنداز، گزەوون، تەڵەکەباز، فەنباز، داوباز، (کە.) بەمزاج، بەدەک، تافتەخۆر، قوڵتەباز، کەرسەگ. ــ ی: تەشقەڵەبازی، ڕیپۆیی، ڕیپۆکەری، فەنبازی.

**فێڵپا:** بیماری لاق ئاوسان، قاچ پەنهان. *

**فێڵزان:** فێڵباز.

**فێڵ و تەڵەکە:** فێڵ و فەرەج، فێڵ و قومار بازی.

**فێڵ و فەرەج:** فێڵ، فرلداخ، تەشقەڵە، گێچەڵ، لیپ.

**فێ لێ هاتن:** خووگرتن، دووچاری دەردی، فێ بوون.

**فێنک:** هنک، هۆنک، هێنک، کوورپە، هوون، هوونک، تازی، تەڕ، (باک.) تەڕایی، چتێک یا شوورێنێکە نەساردبێ و نەگەرم.

**فێنکاوی:** فێنکایی، جێگا و شوورێنێکە وەکوو کوێستان.

**فێنکاهی:** فێنکێتی.

**فێنکایی:** فوونکاهی، هێنکاهی، فێنکێتی شوورێن و چتی فێنک.

**فێنکێتی:** فێنکاهی.

**فێنکی:** فێنکێتی.

**فێهرس** (باد.): بلیمەت.

**فهرست:** پێرست.

**فیەڵ:** پووچ، پووچەڵ.

**فیت** (باک.): گەورە و زل و ئەستوور. پیت و بەرەکەت، فەڕ. (کە.) گاڵ، هان. ــ دان: هاندان، گاڵدان، بزاوتن، بزواندن، جووڵاندن، تاودان.

**فیتە:** فیتوو. دەنگی جغارەکێشانێیە، خیزەخیز، دوودک. ــ ی بلوورێری: (باک.) پزپزک، دەنگێکە لە چوونە ژوورەوەی هێندێ چتەوەدێ بەکونێکا یا هاتنە دەرەوەی لە کونێکیدا، ئەو کونە ــ ی دێ واتە بەتەوەژم بای پێدادێ.

**فیتەبەدەورە:** فیکە بەدەورە، بەشوێن چتێکیدا گەڕان.

**فیتەفیت**: دەنگی فیتووی یەک لەدووای یەکی نەپساوەوەیە. دەنگەدەنگی فیتوویە. دەنگەدەنگی فیتفیتەیە لە جگەرەکێشانێدا دەنگ لێوەهاتن، دەنگی جغارەکێشانێ، خزەخز، خیزەخیز.

**فیتفیتە**: فیزفیزۆک، فیکەفیک، فیق فیقە، (لو.) تیفتیفە.

**فیتدان**: هاندان، گاڵدان.

**فیتکە**: فوویەکە لەسەبیلەی دەکرێ بۆ فڕێدانی سووتووەکەی.

**فیتۆ** (باک.): فایتوون، عەرەبانەی چکۆڵە.

**فیتوو**: فووت، (باک.) هەش، فیتە، (بابا.) فیکە، (باک.) سووسووک.

**فیتوولێدان**: چڤین، فیکاندن، فووتدان، فیکین، کوویتان، کوویتاندن، کووفێن، کووفین.

**فیج**: گیاندارێکە ددانی پێشووی کەوتبێ، (هەورا.) چتی خوواروڵا.

**فیچ**: کەل، ددانکەوتوو.

**فیچان**: وەرگەران و پێچ کردنەوە.

**فیچانەوە**: (بابا.) نووچانەوە، داهاتنەوە، خوواربوونەوە، (هەو.) قەیچانەوە.

**فیچاندنەوە**: چەماندنەوە، داهێنانەوە.

**فیچەڵفاچ** (کۆ.): ناڕاست، ساختەکار. (کۆ.) ـــ ی: ناڕاستی، ساختەکاری.

**فیچقە**: ـــ ی ئاوێ: ترومپا، کونێکە یا لوولەیێکە ئاوێ فڕێ بدات بە توندی، فشتاق، فیسقە، (باک.) فچقە، (باک.) تیرۆچکە، فیقیژن. ـــ کردنی خوێن: بە توند و تیژی خۆ ئاوێژتنی خوێن، بلیسکە، تیرۆچکەکردن، بەخوڕهاتن، بەرێژەوەهاتن، فیشقەبەستن.

**فیچقەبەستن**: بازرەقەبەستنی شلەمەنی لە کوندە و مەشکە و کووپە و گۆزە و ئیتردا بە هۆی کون بوونیەوە.

**فیچقەکردن**: دەرچوونی شلەمەنی لەهەر جوورە دەفرێکی بێ بەباریکی و توندی.

**فیراز**: تەقە، ڕەو. ـــ کردن: تەقەتێکەوتن، ڕەوکردن، ڕەمین، ڕاکردن، هەڵاتن. ـــ پێکردن: ڕەواندن. ـــ ی: هەڵاتوو، ڕەویو.

**فیڕاندن**: (ڕۆژ.) فڕکاندن، (لو.) فیرکاندن، زکچوونی گیان لەبەران بە تەووژم.

**فیڕانن**: فیڕاندن.

**فیڕە**: دەنگێکە لە کۆمی گیانداری ڕەوانەوە دێ لەکاتی پیسی کردنێدا فیڕەفیڕی زۆر.

**فیڕەفیڕ**: فیڕەی یەک لەدووای یەکتری، فیرەهۆڕ، بەخۆداریان. ـــ ی ئامرازی ئۆتۆمۆبیلی، دەنگی بۆڕی ئۆتۆمۆبیلییە.

**فیرکان** (کە.): فیڕاندن، زگچوون.

**فیرکاندن**: فیڕاندن.

**فیرکە**: گیابرە. دەردێکە بە گیاندار بگات بەخۆیدا دەفیرێنێ و کوژندەیە.

**فیرن**: گیاندارێکە زۆر بفیرێنێ.

**فیرنەگوڵە**: باڵندەیەکی بچووکی کەوەلەی درێژە و زۆرگچکەیە.

**فیرۆ** (بابا.): خۆڕایی، خۆڕا، خۆڕاوبۆڕا، (کە.) فیڕوو. ـــ یی: خۆڕایی.

**فیز**: لووت بڵندی، هەوا، حینوان، تڕزلی، ڕێڤ، فیس، ڕێڤناهی. بە ـــ : بەهەوا، فیزدار، حالۆر، قاپان،کاو، بڕووغ، تڕزل، تڕتۆپ، گونە، خز، گیف، دفرە، خۆبین.

**فیزار** (باک.): گلەیی، هاوارو داد.

**فیزە**: دەنگێکە لە فیبکە دەچێ.*

**فیزەفیز**: فززە، فزز، دەنگی جوورە فیتفیتەیەکیە.

**فیزدار**: بەفیز، بەهەوا، تڕزل، گوونە، خز، (باک.) گیف، دفرە، خۆبین. ـــ ی: باسەری، بەفیزی،بەهەوایی، تڕزلی، گیفی، خزی، گوونەیی، خۆبینی، بستەهی، قاپالی، (باک.) برووغی، تامساری، خووەبینی، دفرەیی، خۆهەڵکێشان، لەخۆدەرچوون، خۆنوێنی.

**فیزفیزۆک**: فیت فیتەی منداڵان، فیک فیکە.

**فیزن**: فیزدار، بەفیز.

**فیزۆک**: باقەبێنە.

**فیزێن** (باک.): فززە فززی بای.

**فیزین** (باک.): خوشینی مار، بفیزە: بخوشە.

**فیس** (باک.): فیز، هەوا. خووس.

**فیسا** (باک.): بەهەوا، لووت بڵند، فیززل.

**فیسار** (موک.): فیسکە، (ئەردە.) بێمان، فلان، ووتەیێکە بەکاردێنرێ بۆیەکێک، کە نەتەوێ ناوی ببەیت: ـــ کەس ڕۆیی واتە ئەو کەسەی، کە خۆم و خۆت دەیناسین و دەیزانین.

**فیسارە**: فیسار.

**فیساندن**: خووساندن.

**فیسانن**: فیساندن.

**فیساو**: خووساو.

**فیساوە**: خووساو.

**فیسەڵ** (ئەردە.): چتی پووچ.

**فیست** (باک.): فیستەقەر، حەوت ئاسمانان.

**فیسقە**: فسقە، فیچقەی ئاوێ، فشتاق. کلک هەڵتەکێنە، قنگ هەڵتەکێنە. پیوازی وورد بۆ تۆو، (هەورا.، بابا.) قیسکە. فیرنەگولە.

**فیسقەبەستی**: فیچقەبەستن.

**فیسقەگولە**: (کۆ.) فندەگولە، (کە.) فرنەگولە، فیرنەگولە، (ئەردە.) فیسقە، باڵندەیەکی چکۆڵە و پووچەڵەیە، ئەوی وابێ وەوی دەچوونێن، دەڵێن پایزان ئاوێ ناخوواتەوە چونکوو هەموو شووان و گاوانێک دەیخوواتەوە.

**فیسکاندن**: فساندن.

**فیسکە**: فیسار.

**فیسکین** (باک.): فسان، پێدافسان، بفسە: پێیدا بفسە.

**فیسیان** (ئەردە.): خووسان، خووسیان.

**فیشار**: فیشاڵ.

**فیشاڵ**: بافیش، لاف، پڕبێژی، درۆکیفە، فۆڕتەکی، درۆی زل. ـــ کردن: خۆهەڵکێشان. ـــ کار: خۆڵکێش، تڕوتۆپکار.

**فیشاڵباز**: خاوەندفیشاڵ. ـــ ی: فیشاڵکردن.

**فیشاڵچی:** کەسێکە فیشاڵی زۆر لێ بدا.

**فیشاڵچێتی:** فیشاڵ زۆر لێدان.

**فیشاڵکار:** فیشاڵباز. ــ ی: فیشاڵبازی.

**فیشاڵکەر:** فیشاڵباز، فیشاڵچی.

**فیشاڵکردن:** درزهەڵبەستن.

**فیشاڵ لێدان:** فیشاڵکردن.

**فیشانن** (ئەردە.): پژاندن، پژانن، فیشقانن.

**فیشە:** دەنگێکە وەکوو دەنگی فیشەکە شێتە وایە، فشە، بە دەنگی شیردۆشینیش دەڵێن.

**فیشەفیش:** فیشەی یەک لەدووای یەکتری.

**فیشەک:** ئاگربازی، فیشەکی ئاووربازی.

**فیشەک:** فیشەنگ، شەنگ، گوللەی تۆپ و تفەنگ و دەمانچە و ئیتر.

ــ پڕکردنەوە: فیشەکدا گرتنەوە.

**فیشەکەشێتە:** چتێکە وەکوو فیشەک لە کاغەز و بارووت دروست دەکرێ و ئاگری پێوەنرێ و فیشەدەکا و وەحەوا دەکەوێ.

**فیشەکبەند:** فیشەکدان.

**فیشەکدان:** خەلیت، خەلیتۆک، فیشەکبەند، (جا.، هەورا.، ڕۆژ.) ڕەخت، قاتە، فیشەنگدان، خەریتە، (باک.) جەودک.

**فیشەکدانی پەستەک:** بڕوانە: پەستەفیشەک.

**فیشەک فڕێدەر:** مرازێکە لەناو تفەنگ و دەمانچەدا فیشەک فڕێ دەداتە دەرەوە.

**فیشەک گیر:** ئامرازێکە چەند دانەیەک فیشەکی تێدەخرێ دەخرێتە پاشی تفەنگ و دەمانچەوە.

**فیشەکلغ:** فیشەکدان.

**فیشەکلۆغ:** فیشەکدان.

**فیشەنگ:** فیشەک. شەنگ.

**فیشتەر** (هەورا.): پتر، زۆرتر.

**فیشقانن** (ئەردە.): فیشانن.

**فیشقە:** دەنگی ئاوە لەکاتێکیدا، کە بەدەم یا بە فیچقە فڕێ بدرێت، فیچقەی خوێن و شلەمەنی. ــ کردنی تۆی مرۆ لە قامیشیدا بۆ دەرەوە، پڵدان.

**فیشقی:** کەسێکە هەر لە خۆیەوە تووڕە ببێ.

**فیشکە:** جوورە دەنگێکە وەکوو دەنگی ماری وایە، دەنگ و فیشاندنی مار.

**فیشکەفیشک:** لووشەلووش، فیشکەی یەک لەدووای یەکتری.

**فیشک و هۆڕ:** فیشکەفیشکی زۆر، فیشی فیشی زۆر.

**فیشۆ** (هەر.): درۆزن، بەفیشاڵ.

**فیغان:** دادوهاوار و ئەفغان، فەریاد وگازییە.

**فیفیک** (باک.): فیتفیتە، (باک.) پیپیک، فیکەفیک.

**فیقانن** (ئەردە.): جیقاندن.

**فیقاندن:** فیقەکردن.

**فیقانن:** فیقاندن.

**فیقە** (کە.): زیڕەی فیت فیتەیە. قەفی جوورە گیایەکییە، کە فیتووی پێ لێ دەدەن. جوورە دەنگێکە وەک دەنگی فیقفیقە. فیتە، فیکە

**فیقەفیق:** فیقەی یەک لەدووای یەکتری، فیکەفیک.

**فیقەنەی زوڕنا:** پیک، فیقفیقەیەکە لە قامیش دروستدەکرێ لەسەری زوڕنای دەخەن فووی تێدەکرێ.

**فیق فیق:** فیکەفیک.

**فیق فیقە:** فیتفیتە، فیکفیکە.

**فیقن:** گیانداری لاوازولەڕ.

**فیقنە** (کە.): پیک، پارچە قامیشێکی شەقکراوە دەخرێتە سەر دووزەلە و زوڕنا بۆ پف پێدا کردنی.

**فیق و هۆڕ:** جیق و هۆڕ، پریک و واک، بریک و هۆڕ، بریق و هۆڕ.

**فیقی** (باد.): میوە.

**فیقیژن** (خۆ.): (موک.) فیشقە، فیچقەی خوێنی.

**فیک:** هان، فیت. ــ دان: هاندان، فیتدان. فێڵ، هەزارفاکم بە فیکێکت. (باک.) فیکە، فیتە، دەنگی دەم و لێوی مرۆیانە.

**فیکافووی** (باد.): هەنگووین.

**فیکاندن** (باک.): فیتولێدان، فیکەکردن.

**فیکانن:** فیکاندن.

**فیکە** (بابا.، کە.): فیقە، فیتوو، جوورە دەنگێکی باریکە بە لێو لێ دەدرێ بەدەم باوە لەمزار دێتە دەرەوە، شووان ئاژاڵی پەیْ لێ دەخوڕێ، سووار ئەسپی پێ ئاودەدا و هێمنی دەکاتەوە دز هاواڵەکانی خۆی پێ ئاگادار دەکاتەوە.

**فیکە:** فینکەی گریانێ.

**فیکەبەدەورە:** فیتەبەدەورە.

**فیکەفیک:** فیقەفیق، فیلکەفیلک، فیکەی یەک لەدووای یەکتری. فیتەفیت بۆ فیتوو و ئیتر بەکاردەبرێ.

**فیکەکونێ** (کە.): خۆشاردنەوە، گەمەیەکی منداڵانەیە، چاوشارکێ، ووشەیەکە لە گەمەی (قەڵاقەڵا) دا دەکوترێ بۆ خۆشاردنەوە.

**فیکەوکونا** (کە.): چاوشارکێ، خۆشاردنەوە، فیکەکونێ.

**فیکەوەکونێ:** فیکەکونێ.

**فیکەی مار:** فیتووی مارییە.

**فیکفیک** (باک.): بڵمەبڵم، مرقەمرقی بەرازی.

**فیکفیکە:** فیقفیقە، فیتفیتە.

**فیکنە:** ئافرەتی بێ شەرم و سووزانییە.

**فیک و هۆڕ:** فیکەفیکی زۆر.

**فیکین** (باک.): فیتولێدان.

**فیل:** داعبایەکی گەورەی گەرمیانی بەهێزە سەروملی ئەستوور و زلە دەمی ناگاتە زەوی بە قورتمی چتی لەسەر زەوی کۆدەکاتەوە و بڵندی دەکات و دەیگەیەنێتە زاری و دەیخوا. پایەی بچووکە لەنێو ئاوێدا دروستدەکرێ بۆ بەشبەشکردنی. مرازێکە لە گەمەی شەترەنجێدا ناوی دامەیێکییە لە دامەکانی گەمەی شەترەنجێ.

**فیلار:** فیلال.

**فیلەتەن:** زل، ئازا، لەندەهۆر، زەبەللاح، لاهێر.

**فیلەگێجە:** فیلەگێژە.

**فیلەگێژە:** فیلەگێجە، گاکێوی، (ڕەوا.) شورر، (باک.) شڤر، کێوییەکە بە قەد کەڵەکێوییەکی دەبێ دووشاخی یەک لقی هەیە لەڕەنگ و شکڵدا وەکوو ئاسک وایە بەلاَم لە ئاسک گەورەترە وەکوو سەگی دەوەڕێ و گۆشتیشی دەخورێ. گوڕ.

**فیلپایە:** پایەیەکی ئەستوور و قایمە لەبەردەمی دیوارێکیدا دروستدەکرێ، کەوورگی دابێ. پایە ودینگەی گومبەزانە کە بەخشت یا بەرد دروستکرابێ.

**فیلچین** (هەورا.): کاری پڕو و پووچ، کاری بێ واتا و گەند.

**فیلکەفیلک:** فیکەفیک.

**فیلکەفیلک:** حیلکەحیلکی پێکەنینێ، زەفین.

**فین** (باک.): شووش، باریک.

**فینا** (باک.): کلاَوی شەوێ لە لبادی ڕەشە. مینا.

**فیناز:** کردەوەی ناشیرین.

**فینە** (کە.): جوورە سەگێکی چکۆڵەیە، تووڵە.

فینجان

**فینجان:** فنجان.

**فینجانێن:** کەمەیەکە بە فینجان دەکرێت.

**فینجە:** ووشەیەکە هەمیشە لەدووای ئینجەوە بەکاردێنرێ، واتای پتر، زۆرترە، کەهەر قسەیەکی دەیکەی ئینجە و فینجەی پێوە مەنێ و مەیڕازێنەوە. ئینجە، ئینجەوئینجە، خشڵ، کەرەستەی ڕازاندنەوە.

**فینکە:** فونگە، فینگە، فینکەفینک.

**فینگەفینگ:** فینکەی گریانی یەک لەدووای یەکتری بە بێ پسانەوە، فونگەفونگ، فینگەفینگ.

**فینیگە:** دەنگی گریانێیە بەلووت.

**فینگەفینگ:** فینکەفینکی گریانێ یەک لەدووای یەکتری.

**فیتۆ** (باک.): فێس، کۆمی کوررە، فەیسە، فاسە.

**فینوو** (باک.): تاواندار، تاوانبار، سووچدار. لاپرسەنی.

**فیوورچۆ** (باک.): کاول، وێران، تیک. ــ کرن: کاولکردن.

# ڤ

**ڤ:** تیپێکی ئابێی کوردییە.

**ڤا** (زا.): با. (باک.) ئەوان، لە بنچینەدان (ڤان) ە کوردەکانی شامێ بۆ تاکە کەسێکیشی بەکاردەبەن، واتە: ئەو.

**ڤاج** (باک.): کەنار، گۆشە، قاد.

**ڤاج:** ئاقار، شوێن، تەنشت.*

**ڤادار** (هەورا.): بادار. ــ ی: باداری.

**ڤادان** (هەورا.): بادان.

ڤار

**ڤار** (باک.): مریشک.

**ڤاران** (زا.): بارانە، واران.

**ڤارتۆ:** ناوی شارێکی کوردانە لە هێلای ئەرزە ڕۆمێ.

**ڤارقلاندن** (باک.): وەدرەنگخستن.

**ڤارقلین** (باک.): وەدرەنگ کەوتن.

**ڤارک** (باد.): بارۆکە.

**ڤاری** (باک.): تەنها. ــ کرن: تەنهاکردنەوە.

**ڤاریتی** (باک.): ناپایەداری.

**ڤارین**(باک.): بارین.

**ڤاژی**(باک.): هەڵگەڕاوەوە، وەرگەڕاو، ئاوەژوو. ــ کرن: وەرگەڕاندن، ئاوەژووکردنەوە.

**ڤاڤێر** (باک.): چەچە.

**ڤاڤێرکرن** (بار.): هەلاَواردن.

**ڤالا:** ئاوەڵە، بەتاڵ، چۆل، والاَ، (هەو.) وەلا.

**ڤالابوون:** بەتاڵ بوون.

**ڤالاکرن:** بەتاڵکردن.

**ڤالاهی** (باک.): بەتاڵی، چۆڵێتی، خاڵێتی.

**ڤالە:** چۆل، بەتاڵ.

**ڤالەبوون:** چۆل بوون.

**ڤالەهی** (باک.): بڕوانە: ڤالاهی.

**ڤان** (باک.): ڤا، ئەوان، وان. (باک.) ویستن، ئارەزوو.

**ڤانا** (باک.): هۆوانە (بۆدوورە).

**ڤانێها** (باک.): هۆوانە. هۆووانە (بۆ زۆر دوور).

**ڤانێهانی** (باک.): هۆوانێها.

**ڤاوڤاران** (باک.): باوباران.

**ڤایە** (باک.): وایە، ئەوەتا، هۆوەتا.

**ڤایوەشت** (زەن.): بای نیوەڕۆ.

**ڤە** (باک.): ووشەیەکە بۆ دووپاتە کردنەوە و گەڕانەوە، بادانەوەیە، لەپێش ووشان دادەنرێ وەکوو ڤەخووارن: خوواردنەوە، ڤەبزدین: پسانەوە. (باک.) وە، ئاوەڵەیە بەلاَن لەپێش ووشان دادەنرێ وەکوو: ڤەکرن: ئاوەڵەکردن، کردنەوە. ــ بوون: ئاوەڵەبوون، کرانەوە. (باک.) ئێوە، هوون، هنگ.

**ڤەبال** (باک.): وەباڵ.

**ڤەبچڕاندن:** ڕوونکردنەوە و دەرخستنی شتێک بۆ زانین.*

**ڤەبڕاندن** (باک.): قڕکردن.

**ڤەبرک** (باک.): کاڵکاڵی.

**ڤەبری** (باک.): پایەدار، قایم، مەحکەم، چتێکە هەر لە جێگای خۆی بێ و نەگۆڕێ.

**ڤەبڕین** (باک.): قایم و مەحکەم کردن.

**ڤەبزداندن** (باک.): ترساندنەوە، پساندنەوە.

**ڤەبزدین:** پسانەوە، ترسانەوە.

**ڤەبوور** (باک.): پاشەکەوتی.

**ڤەبوون** (باک.): کرانەوەی دەرگە و چتی تر، پشکووتن.

**ڤەپچراندن** (باک.): ئاشکراکردن، دەرخستن، روونکردنەوە.

**ڤەپژلاندن:** پیلە، بەربەرەکانی کردن و ڕژێبیشتن لەسەر قسەیەک.

**ڤەپیرین** (باک.): بڕینەوەی سەوداو مامەڵە.

**ڤەتڕاندن** (باک.): پاڵدانەوە و ڕاکشانە لەسەر زەوی.

**ڤەترسین** (باک.): چابوونەوە لەنەخۆشی.

ڤەجنقاندن

**ڤەجقین** (باک.): ڕاچڵەکین.

**ڤەجنقاندن** (باک.): بازدان، قەڵەمبازدان، بازپێدان، قەڵەمبازپێدان، ڕاچڵەکاندن.

**ڤەجنقین:** بازدان، قەڵەمبازدان.

**ڤەچڕاندن** (باک.): ڤەپچڕاندن، شیّ کردنەوە.

**ڤەچناندن** (باک.): چنینەوە، پینەکردن، چنینەوەی چتی هەڵوەشاو.

**ڤەچنین** (باک.): چنینەوەی گۆرەوی و چتی تر، خۆپارازتن لە چت.

**ڤەخارن** (باک.): خواردنەوە.

**ڤەخووارن** (باد.): خواردنەوە.

**ڤەخووانددن** (باک.): بانگهێشتن کردن.

**ڤەخووەندن** (باک.): بانگهێشتن کردن.

**ڤەخوماندن** (باک.): جوولاّندن، شێواندن، ڕاوەشاندن و تێکدانی چت.

**ڤەخومین** (باک.): جوولاّن، شێوان، شڵەژان.

**ڤەدان** (باد.): جووایەزکردنەوە، ئاوەڵەکردنەوە. دانەوە و هەڵکەندنی زەوی بۆ خێوەت هەڵدان، یا بۆ تەڵەنانەوە. (باک.) خۆشکردنەوەی بارانە.

**ڤەدانەر:** داهێنەر.

**ڤەدڕاندن:** (باک.) ڤەچراندن، دڕاندن.

**ڤەدزین** (باک.): خۆدانووساندن، خۆشاردنەوە.

**ڤەر** (هەورا.): پێش، بەر.

**ڤەرانڤەر** (باک.): بەرانبەر.

**ڤەرانبەر** (باک.): بەرانبەر.

**ڤەرە** (هەورا.): وەرە، (هەورا.) بۆری.

**ڤەرەشان:** ڕشانەوە، شەبەکەخراپکردن.

**ڤەرەشاندن** (باک.): ڕشانەوە، شەبەکەخراپ کردن، هێنانەوەی خواردن، ڕشاندنەوە.

**ڤەرەلاّیی:** شایی دڵ، پێسووتان و بەزەیی.

**ڤەرەمەک** (باک.): بنکڕ.

**ڤەرساندن** (باک.): دڕاندن، شکاندن، کردنەوەی تەوق و کۆت و زنجیر.

**ڤەرستن** (باک.): شکاندن، دڕاندن.

**ڤەرستیای** (باک.): هەڵوەشان.

**ڤەرسمێل** (باک.): بەرسمێڵ.

**ڤەرسهاندن** (باک.): حەساندنەوە.

**ڤەرسین** (باک.): ڕزگاربوون.

**ڤەرفە** (باک.): بەفر.

**ڤەرق** (باک.): گورگ.

**ڤەرقلین** (باک.): درەنگ بەسەرداهاتن، دوواکەوتن لە کارێک.

**ڤەرک** (باک.): گورگ.

**ڤەرکەمەر** (باک.): گیابەند، گیایەکی بۆنخۆشە.

**ڤەرملین** (باک.): ماندووبوون.

**ڤەرووتاندن:** ڕووتاندنەوەی تووک و موو.

**ڤەرووتن:** خواردنی تیکوڵە شینەکەی قەزوانییە.

**ڤەرووچکاندن** (باک.): ڕنینەوە، ڕووتاندنەوە، لەڕەگ و ڕیشە دەرهێنانی موو و تووک، ئاوەڕووتکردن.

**ڤەرێس** (باک.): ڕستن، پێچ کردنەوە بەچتێک.

**ڤەرێلایی** (باک.): (باک.) ڤەرەلایی.

**ڤەرێچاندن:** ڤەرووچکاندن، ئاوەڕووتکردن.

**ڤەرێشاندن** (باک.): شەبەکە خراوکردن.

**ڤەرێک** (باک.): گیرفان.

**ڤەزەلاندن** (باک.): تلدان، فڕێدان، خلۆرکردنەوە، ڤەزەلینە: فڕێدە.

**ڤەزەلین** (باک.): فڕێدران، خلۆربوونەوە.

**ڤەزفڕاندن** (باک): گەڕاندنەوە، ناردنەوەی چتێک.

**ڤەزفڕین:** گەڕانەوە.

**ڤەزلاندن** (باک.): پاڵدانەوە، خۆدرێژکردن لەسەر چتێکی، خووە ڤەزلینە: خۆت درێژ بکە.

**ڤەژاندن** (باک.): بووژاندنەوە، ژیاندنەوە.

**ڤەژەن** (باک.): هێز، توانایی. ـــ ی: هێزدار.

**ڤەژەندن:** شیّ کردنەوە و پەرەکردنی لۆکە و موو و خوری و ئیتر.

**ڤەژین** (باک.): ژیانەوە، بووژانەوە.

**ڤەس:** بەس.

**ڤەس و ڤەس** (هەورا.): بەس و بەس.

**ڤەسهاندن** (زا.): پشوودان، حەسانەوە لە ژێر سێبەراندا.

**ڤەشارتن:** ڤەشارن، شاردنەوە، پەنهان کردن.

**ڤەشارتی** (باک.): شاردراوەوە، بەخاک ئەسپێرراو.

**ڤەشارن** (باک.): شاردنەوە، بەخاک ئەسپاردن.

**ڤەشاندن** (باک.): ناردنەوە.

**ڤەشوشتن:** شوشتنەوە.

**ڤەشین** (باک.): داوەشاندنی جلکی دژووێن، تەکاندنی داری بەردار.

**ڤەفر** (باک.): شکاندنی پەیمان.

**ڤەفرژین** (باک.): هەڵوەشاندن.

**ڤەقەتاندن** (باک.): جووێ کردنەوە، هەڵاّواردن، پەزی خووە ژناڤ پەزێ بارامی ڤەقەتینە.

**ڤەقەڵاشتن** (باک.): قەلاشتن، قەلاشتنەوە.

**ڤەقتاندن** (باک.): کردنی کەمێک لەکارێک.

**ڤەکارین** (بار.): کاوێژکردن.

**ڤەکەتن** (باک.): ئەکەڤە، درێژبوون، پاڵکەوتن، ڕاکشان.

**ڤەکەر**: کەرەوە، ئاوەڵەکار.

**ڤەکرن** (باک.): کردنەوەی چت، ئاوەڵەکردن، ڤەکە: بکەوە (بۆدەرکە و پەنجەرە و ئیتر).

**ڤەکری** (باک.): کراوەوە (بۆڕەنگ).

**ڤەکشاندن** (باک.): ڕاخستن، کێشانەوە.

**ڤەکشکشاندن** (باک.): ڕاخستن، ڕاونان.

**ڤەکوژتن** (باک.): کووژاندنەوەی ئاگر و چرا.

**ڤەکوودار** (باک.): شایانی هەڵگرتنێیە لەوانەیە هەڵگیرێ، بەرباد.

**ڤەکێش** (باک.): کێشان. ـــ دانخووە: خۆکێشان.

**ڤەگەڕ** (باک.): گەڕاوەوە، کەسێکە دووای کارێک کەوتبێ.

**ڤەگەڕان** (باک.): گەڕانەوە، گەڕانەڤە، سەرچاوە لە چاوگەشە و بۆ گەلێکی نەدیویش دەبێ.

**ڤەگەڕاندن** (باک.): گەڕاندنەوە، گێڕانەوە.

**ڤەگەڕین** (باک.): گەڕانەوە.

**ڤەگەشبوون** (باک.): گەشبوونەوە، گەشانەوە، گەشەکردن و بەخۆداهاتن.

**ڤەگەڤزاندن** (باک.): گەوزاندن.

**ڤەگەڤزین** (باک.): پیلەگرتن، پێداهەڵتەقین.

**ڤەگرتن** (باک.): گرتن، داگیرکردن.

**ڤەگژان** (باد.): هەژان، جووڵان.

**ڤەگژاندن**: هەژاندن، جووڵاندن.

**ڤەگزگزاندن** (باک.): تەکان پێدان، ڕزگارکردن.

**ڤەگزگزین** (باک.): تەکاندان، خۆڕزگارکردن.

**ڤەگژلان** (باد.): خۆهەژاندن، خۆڕاوەشاندن.

**ڤەگژلین** (باد.): ڤەگژلان.

**ڤەگڤزاندن**: کێشە، پیلە، ووتووێژکردن.

**ڤەگڤزین**: دروان، پیلە.

**ڤەگوهازتن** (باک.): گوورێزتنەوە.

**ڤەگێڕان** (باک.): گێڕانەوە، وەلاّم دانەوە. لێ ـــ: وەلاّم دانەوە.

**ڤەلا** (باک.): ڤامچی.

**ڤەمراندن** (باد.): کووژاندنەوەی ئاگر و چرا، ڤەمرێنە: ئاگر یا چرا یەکەی بکووژێنەوە.

**ڤەمرتی**: ڕەنگ هەڵبزرکاو، ڕەنگزەرد، ڕەنگ پەڕیو.

**ڤەمرین** (باک.): کووژانەوەی ئاور و چرا.

**ڤەمستن** (باک.): هەڵمیژتن، هەڵقوڵین.

**ڤەنان** (باک.): هەڵنیشتنی باڵندانە لەسەر لکی داران.

**ڤەناندن** (باک.): بڵندکردن، هەڵگرتن.

**ڤەنشتن** (باک.): هەڵنیشتنی باڵندان، نیشتنەوە.

**ڤەنهەڕاندن** (باک.): هەڵستاندن، پێهەڵگرتن، ڤەنهەڕیتە: هەڵستێنە.

**ڤەنهەرین** (باک): هەڵستان، هەڵگرتن.

**ڤەنی** (هەورا.): قەمزوانی شین، وەنی.

**ڤەوەژارتن** (باک.): هەڵوەژاردن، پاک کردنەوە، هەژاندن، تەکاندن، خولدان، بژاردنی دانەوێڵە.

**ڤەوەشاندن** (باک.): تەکاندن، هەژاندن.

**ڤەور** (باک.): بەفر.

**ڤەوراندن** (باک.): ئاشکراکردن، پەردە لەسەرهەڵگرتن.

**ڤەهاتن** (باک.): شێ هەڵهێنانی دانەوێڵە لە شووێنی غدار.

**ڤەهاندن** (باد.): هۆنینەوە.

**ڤەهە** (باد.): ئاوا، وەها.

**ڤەهەراندن** (باک.): بەردانی ئاژاڵە بۆسەر ئاوێ یا سەر خووێی.

**ڤەهەژان** (باد.): جووڵان، هاتوو چۆیەکی بەفیزو بەهەوایە.

**ڤەهەژاندن** (باد.): جووڵاندن.

**ڤەهەواندن** (باک.): کۆکردنەوە، گردکردنەوە.

**ڤەهەوین** (باک.): ڤەهەن.

**ڤەهێشت** (هەورا.): بەهەشت.

**ڤەیە** (هەورا.): ئەوەتانێ، ئەوەتا، وایە.

**ڤەیدان** (باک.): کۆ و خڕکردنەوە.

**ڤتن** (لک.): ووتن، کوتن.

**ڤج** (باک.): دەنگی ئاوەڵە بوون و دەربوونی برین و زیپکە.

**ڤڕ** (باک.): درۆ، بوختان. ـــ کرن: درۆکردن. ڤوم، ڤڕ. ـــ یێک ئاو: قومێک ئاو.

**ڤر** (باک.): نێرە.

**ڤڕڕ** (باک.): دەنگی ئاوێژتنی بەردیییە.

**ڤرا** (باک.): نێرە

**ڤراسەی** (هەورا.): (هەورا.) ووراسەی، دروومان، دروون.

**ڤراڤە** (باک.): چتی پرووپووچ، وورێنە.

**ڤرال**: ئیمپەراتۆر.

**ڤرە** (باک.): ڤنگە، دەنگی بەرد و چتی ترە لەهاویژتنێدا یا هی چتێکی، کە بخولێتەوە.

**ڤرەڤرە** (باک.): ڤنگەڤنگە، ڤرەی یەک لەدووای یەکتری.

**ڤرەک** (باک.): زۆردرۆزن.

**ڤرت** (باک.): دەنگی بای زگییە، بۆیە بۆ درۆزنان بەکاردەبرێ، زرت و فرت: جرت و ڤرت.

**ڤرتۆ** (باک.): بۆمێیینانە، دەنگی بای زگییە، بۆ جنێو بەکاردەبرێ. پرتۆ و ڤرتۆ ناوی دوو پاڵەوانی چیرۆکی شێری چیایە چرتۆ بەستوویە و ڤرتۆ بەری داوە بۆیە شێر ئاخ و ئاڤێ وێ وولاّتی لەخۆی حەرام کردووە.

**فرتوفین**: مرۆڤی پڕ و پووچ و بێ نرخ.

**فرتونەک** (باک.): چێتی لاواز و بێ تام.

**فرتی** (باک.): دەنگی بای زگە بۆ مێ پیینانە بۆ جنێو بەکاردەبرێ.

**فرچ**: دەنگێکە لە چراقێ دێتەدەر، لە برین و (پزکا) ش دێتەدەرێ.

**فرچالە** (باک.): ترسەنۆک.

**فرچقین** (باک.): لاوازی گیاندار.

**فرچین** (باک.): دەنگی تەقین و دەربوونی برینانە.

**فردە** (باک.): ـــ وەرە: وەرە ئێرە، بهرە دەوەرە ئێرە.

**فردە و ئیدە** (باک.): پرسیار و وەڵام، بێ ـــ: بەبێ پرسیار و وەڵام. دان و وەرگرتن.

**فرسهاندن** (باک.): حاواندنەوە.

**فرفراندن** (باک.): جووڵاندن، تلدان بەچت.

**فرفرە** (باک.): (باک.) زرنگەو ویزەی چت، (بۆتا.) خولخولە، فرفرە. (باک.) درۆزن، خوێڕی، سەرسەری، ئەو کەسەیە زۆر درۆیان دەکات.

**فرفرۆ** (باک.): ڤرڤرە. درۆزن.

**فرفرۆک** (باک.): بۆ هەموو چێتێکی وابەکار دەبرێ، کە خڕبێ یا پەروانەی هەبێ و بسووڕێ.

**فرک** (هەورا.): بەرچیغ. ڕیانێکی شلە. (باک.) شۆرباوی گەنمە کوتاوێ یا هەر جوورە دانەوێڵەیەکی بێ کە کوترابێ.

**فرکا** (شام و کیرکا.): ئێرە. (باک.) ڤر، درۆ. ئێروکە، ئێر، تیپی (ک) ێ بۆ گچکەکردنەوەیە.

**فرکەر** (باک.): درۆزن. ـــ ی: درۆزنی.

**فرکرن** (باک.): درۆکردن.

**فرگول** (باک.): خەنەیی، ڕەنگی خەنەیی.

**فرنی** (باک.): سیس و چرچ، بێ تین، درەنگ پێگەییشتوو، ژاکاو (بۆ گژ و گیا).

**فرفراندن** (باک.): جووڵاندن، خولۆرکردنەوە.

**فرفرین** (باک.): جووڵان، خلۆرکردنەوە.

**فرق** (باک.): شڵپە، کەوتنی چێتێکییە لە ئاو یا چێتێکی شلدا.

**فرنی** (باک.): دەغڵێکە لە زستانیدا بچێنرێ.

**فرۆ** (باک.): بۆ نێرینانە دبێژن: ـــ وەکە ڤرێ لە چە دگەڕێ، ڤرێ بەدیلەسەگی دەڵێن.

**فرۆکەر** (باک.): درۆزن.

**فرۆنەک** (باک.): زۆر درۆزن.

**فرووفی**: گۆشتی قەڵەوی گرلاّر.*

**فرەهۆڕ** (باک.): درۆ، ڤرەڤری زۆر.

**فری** (باک.): درۆزن، (باک.) ڤرەکە ـــ، دەرەوین، بۆ نێر ومێیانە. (باک.) جارجارە بە درۆش دەڵێن بۆ مێیینانە.

**فری کرن** (باک.): گووێ نەدان، بەهەند و گرنگ نەگرتن، نەهێنانە سەرخۆ.

**فڕین**: دەنگی ئاوێژتنی بەرد و ئیترە.

**فز**: ڤزژە، دەنگی گوللەیە،

**فزافز**: ڤزژەڤزژ.

**فزە**: ڤزژە.

**فززە** (کە.): ڤزژە ڤزژی لووتی نەخۆشییە، فشەفشی لووتیە.

**فزەفز**: فززەی یەک لەدووای یەکترییە.

**فزبوون**: شل بوونەوە لە کارکردن، خاوبوونەوە.*

**فزفز**: دەنگی زۆری مێش و زەرگەتە.*

**فزقاندن** (باک.): ڤەنیشتن.

**فزک** (باک.): نێزە، چەک، تیر.

**فزین** (باک.): ڤزڤز، خوڕەخوڕکردن، ووزەووزکردن، ووززەی گوللەیە، ویزە. (باک.) ئاوسان، باکردن.

**فژ** (باک.): دەنگی ئاوێژتنی بەرد و چتی ترە.

**فژژ**: دەنگی ڕیانێییە.

**فژال** (باک.): شەپۆلاوی، تاودار (کاکۆڵ).

**فژانەوە** (باک.): ژیانەوە: بووژانەوە.

**فژاندن** (باک.): ژیاندنەوە، بووژاندنەوە.

**فژین** (باک.): دەنگی ئاوێژتنی بەرد و چتی ترە.

**فک**: (باک.) ڤنگ، بەجارێکی، ئێکجاری، لەوانەیە، بنەبڕ.

**فژک**: ڕیانێکی زۆر شلە.

**فژۆ** (باک.): ڕەوانی.

**فژۆکەر** (باک.): ڕەوان. کەسێکە زگی بچێ.

**فف** (باک.): بقە، زاراوەی منداڵانە.

**فشاب** (باک.): هەردیها.

**فکی** (باک.): بەجارێکی، ئێکجاری.

**فل** (باک.): گەیشتنی قونێر و گرێ و برینانە، کوڕی سووک.

**فلفل** (باک.): دەنگێکە ژقولی هاسن یان چەقولێ فرەهتێ. کەسێکە ئاخەفتنی هەلەق مەلەق لەدەمی وی دێتەدەرێ و بێ واتایە، قسەی زەلام و قەڵەو و دەنگێکی ناساز لە زاری وی دێتەدەرێ.

**فلق** (باک.): (باک.) فرق، بەڵان ئەمە هەرچەندە کەوتنی چێتێکە لە ناو شلەمەنیدا بەڵان لەوێدا لێدەدرێ و دەکوترێ.

**فلۆشە** (هەورا.): برویش، ساوار.

**فلێ** (هەورا.): گوێ. (باک.) بۆ مێیینانە بە واتا قوونفرە، قولافرەهـ، بۆ جنێو بەکاردەبرێ، سووک و حیز.

**فنگ** (باک.): دەنگی میشەنگووینییە.

**فن**: دەنگی مێشییە، سرتە، خورت، هەست، چن چن، پست پست.

**فنگ** (باد.): فنکەفنکی لووتی مرۆڤانە.

**فنگە** (باد): بە دەنگی باو مەرزەفیش دەڵێن، دەنگی ئاوێژتنی بەرد و گووللە و هیترە، (باک.) ڤرە.

**فنگەفنگ** (باک.): ڤنگەی یەک لەدووای یەکتری.

**فنگ و هۆڕ**: فنگەڤنگی زۆر.

**ڤنگی** (باک.): بەجارێکی، ئێکجارەکی، لەوانەیە. کوپیێ زینێ ـــ والایە: کووپەی زینێ بە ئێکجاری بەتاڵە، (باک.) ڤکی.

**ڤۆک** (باک.): میز.

**ڤێ**: بڕوانە: ڤ. (باک.) هۆوا بۆ مێیینانە، هۆو، وێ.

**ڤێجا** (باک.): ئەوجا، ئەوسا، ئەودەمێ، ڤێگا، بۆ نیگەرانی و دوودڵییە: ــ ئێمە چبکەین؟.

**ڤێخستن** (باک.): هەڵکردنی ئاور و چرا، هەڵواسین، هەڵاوەسین.

**ڤێڕا** (باک.): بێرەدا، لەنێو، لەدوڕ، (هەورا.) پێکەوە. لەگەڵ.

**ڤیڕە** (باک.): لەگەڵ.

**ڤێرک** (باک.): بەرگی کەلاش.

**ڤێرێ** (یەز.، باد.، زا.): ئێرە، لڤێرێدا، لێرەدا.

**ڤێسین** (باک.): جنێو.

**ڤێقڕاندن** (باک.): کێشاندنەوە، دووبارە کێشاندنەوە، ڕاکێشان، دەرخستن.

**ڤێقرین** (باک.): کشانەوە. دەرکەوتن، ئاشکرابوون.

**ڤێک** (باک.): پێکەوە، وێکڕا. ئاشتی.

**ڤێک ئێخستن** (باک.): کۆکردنەوەی چتی پەڕاگەندە.

**ڤێکەتن**: (باک.) ڕێکەوتن. (باک.) ئاییسان، سووتان، هەڵکران، هەڵبوون.

**ڤێکدان** (باد.): کۆکردنەوەی چت.

**ڤێکڕا** (باک.): پێکەوە.

**ڤێکرە**: ڤێکڕا.

**ڤێکرەگۆتن**: پێکەوە ڕاوێژکردن، تەگبیرکردن.

**ڤێک کەتن** (باک.): کۆبوونەوە، ئاشت بوونەوە.

**ڤێگا** (باک.): ئێستا.

**ڤێگالۆلۆ** (باک.): لەگۆرانیاندا بەکاری دەبەن وەکوو دەلۆلۆ: دەلێ لێ وایە.

**ڤێل** (باک.): دەشتێکە یا جێگایەکە پان و لێژبێ، نزم بێ.

**ڤێن** (باک.): ویستن، خۆشویستن، ئارەزوو، ویستنی چتێک.

**ڤێنا** (باک.): ئەمە، ئەوە (بۆمێیینانە).

**ڤێنی** (زا.): ئەوە.

**ڤێ هەی** (باک.): هەیە.

**ڤی** (باک.): لەئەڤ وەرگیراوە، ویی، ئەوە، ئەو (بۆ یەکێکی ئامادەی نێرە).

**ڤیلا** (باک.): خاکێکە، کە زوقم هەڵی تەکاندبێ.

**ڤیان** (باک.): ویستن، خووازتن، خۆشویستن، پێداویستن.

**ڤیزین** (باک.): ڤزین.

**ڤیزک** (باک.): گووی شل.

**ڤیس** (هەورا.): بیست (٢٠).

**ڤیسکۆل** (هەورا.): دارەبی.

**ڤیل** (باک.): جوورە قاب و قاچاخێکە.

**ڤیلک**: کیسەی دەم تەنک، گەڕ، فیێڵ.*

**ڤین** (باک.): داخووازی.

**ڤینا** (باک.): ئەوە (بۆ نیشاندانی چتێکی نزیکە).

**ڤێنی**: ئائەمە.

**ڤیلیین** (باک.): جنێودان.

# ق

ق: تیپێکی ئابێی کوردییە.

**قا** (باڵە.): قەڵایی.

**قاب** (سەق.، باد.): جک، کەوان. (باک.) بەرگی پەڕتووکان. قاپ، ئامان.

**قابک** (باک.): جک.

**قابڵەمە**: تاسکەباب، تاسکەواو، قاوڵەمە.

**قابڵەمەکردن**: سەرداپۆشین.

**قابلووخ** (ئەردە.): قابلۆخ، کەلووی نۆک، تێکوڵی بەڕوو، کیفسی دانەوێڵە، کاسەی کیسەڵی.

**قابلووخ پەڕتووک**: بەرگی پەڕتووک.

**قابووخە فیشەک**: قەوانە، قابوغەفیشەک.

**قابوور** (باد.): بنەگۆزەی شکاو.

**قاپ** (ئەردە.): قولاپەی کەڵەباب. شیشەی نەفت و چتی دی. (هەورا.، فە. ،شووا.) گوویزنک، چوو، ئێسکە خڕە دەرپەڕیوەکانی لای ڕاست و چەپی پێیە، ڕەقەڵەی نێوانی پێ و لوولاکی پێ. (کە.، هەورا.) جک، میچ. (ئەردە.) چووارچێوە، پەرواز. قولاپە، قولەپێ. لاق، قاچ، قول. قاپ و قاچاخی ناومالّ، ئامان، (ڕەوا.) بادی، جام، سافۆ، کڕکاسە، دەفر، کەبۆل. ــ ی گڵ: گڵێنە. ــ ی چینی: فەخفووری. ــ ی مس. ــ ی گەورە: جگنی.

**قاپارگە**: قولەپێ.

**قاپان** (ڕەوا.): قاتۆر، قالۆر، کالۆر، بەژنی ڕووەکان. (باک.) قەپان، بەخێز، خێزدار. (باک.) خۆپەرست. (ئەردە.) جگێن.

**قاپانە**: بەنێوانی لکەداران دەڵێن. (کە.) جگێن، جگانێ.

**قاپانی**: هەواداری، فیزداری.

**قاپاوێژ** (بابا.): منداڵێکە یا گیاندارێکە خۆی بنگێوێ، کەسێکە لە ڕۆیشتنێدا لاقی لێک بدات. پەیزەن. وولاخێکە دەستەکانی یا پێیەکانی لە ڕۆیشتنێدا لێک بدات و خۆی بنگێوێ.

قاپەرقە

**قاپەڕەقە** (کە.): قولاپە.

**قاپەکەوەلە** (هەورا.): قەیتەران.

**قاپشۆر** (مرک.): کەسێکە قاپ و ئامانان بشوا، بە بووز یا پەرۆیەکیش دەڵێن کە قاپی پێدەشۆردرێ، کنجک.

**قاپشینکە:** (دەر.) قاپکەوڵە، قاپ شینکەرە، گیایەکی هاوینییە و گەڵاکانی تۆزاوی و کوڵکنن و بە سپی دەنوێنن.

**قاپشینکەرە:** قاپ شینکە.

**قاپقاپ:** پێلاوێکی دارینە لەناو ماڵ و لە گەرماواندا لەپێ دەکرا و چەرمێکی باریکی بەسەرەوەیە.

**قاپک** (ئەردە.): ئاوسانی قولاپە.

**قاپکەوڵە** (دەر.): قاپشینکە.

**قاپگرتن:** مەبەس لە بە گژداچوونی یەکێکییە بەکەسێکیدا بەناڕەوایی.

**قاپلۆخ** (ئەردە.): قاپووڕ.

**قاپکزێنە:** گیایەکی بەهارییە و گەڵای وورده بە کوڵاوی دەخورێ.

**قاپۆڕ:** قابوغی فیشەکی بەتاڵە.

**قاپووت:** پاڵتۆ، پاڵتاو، کەرک، فەرەجێکی بەرگن و درێژ و قۆڵکورت بێ ـــ ی پێدەڵێن بەڵام زۆر لە فەرەجی گەورەترە. ساقۆ، ووربە، ئاودامان.

**قاپووتکردن:** مەبەس لەگرتنی سەدوبیست سایەیە لەیاری ئەسکەملەدا.

**قاپووچکە:** قەپووچکە، پارچەنانێکە بە قامک لوول بدرێ وەکوو کەوچک ماست و چتی شلی پێ بخۆن. قەمچووک.

**قاپووڕ:** چتێکە ناوکەکەی دەرهاتبێ و بە هوڵۆڵی مابێتەوە.

**قاپ و قاچاخ:** ئاسنجاو، هێسنجاو، هیربار، هیرماڵ، (کە.) کرکاسە، (هەو.) هەوەڕ، هەووڕ، بە هەموو قاپ و مسی ناوماڵێ دەڵێن.

**قاپوولە** (جا.): گۆزنگی پێ، قولەپێ، قولاپە.

**قاپەاوێز:** قاپاوێژ.

**قاپیلک:** کیفە ڕەقەکەی ڕەقە و کیسەڵییە، بەتێکوڵی بەڕوو و بادام و گوێزیش دەڵێن.

**قاپێن:** جگێن، یاری کردن بە جگ (میچ).

**قاپێوان:** قاپیوان.

**قات:** ئەهوەم، تەبەقە، چین، جار، چەل. خانووی فەرهادی دەقاتە: واتە دەئهوەمە. قەدی جلک و کەلوپەلی پۆشتەمەنی، دەستە. ئازاد دوو ـــ ی بەرگ بە دروستکردن داوە واتە دووقەد، دوودەستە. زنجیرەی خشتی کانی (معـدن). ڕیزی بەردی خشت. گرانی: پارقاتی بوو: گرانی بوو، قات و قڕی. چین، باد، ئەم پارچەیە دووقاتە. هەند، جار: کە بەرداخەکەم بشکێنن: پارەیان دوو قات لێ دەستێنم.

**قاتە:** قەڵداسی داروجان، چەڵتوکی پووچەڵی بێ ئاو. (سوور.) فیشەکدان.

**قاتەتاوێز:** قەتەتاوێر، زنجیرەتاوێر، تاتەتاوێر.

**قاتەڵیوە** (هەورا.): قاتی، قاتی وقڕی، گرانی، خاکەڵێوە.

**قاتەولێوە:** خاکەڵێوە.

**قاتقات:** زەوی تەمتەم.

**قاتڵ** (ئەردە.): ترش.

**قاتۆر** (ڕەوا.، خۆ.): قالۆر، قاپان، بەژنی ڕووەکان.

**قاتۆرک** (خۆ.): نێرتکی گیاو چتی تریشە، کەوشک، قالۆر.

**قاتۆل** (باک.): ووشترخۆرە. ـــ ی: ڕێی هەناری.

**قات وقەیماخ** (ئەردە.): نیوەڤەک، شلکێنەیە کە دەخرێتە سەربرین و جێگای بەنێش. پەڵوولەیێکی چەوری شیرینە بۆ ئافرەتی زەییستان دەکرێ.

**قات و قڕ:** سەردەمێکە، کە دانەوێڵە ساڵی پێشوو نەمابێ و هی تازەش هێشتا پێ نەگەیشتبێ. ـــ ی: قاتی: گرانی، نەمانی دانەوێڵە و خواردەمەنی، نەبوونی چت و گرانی.

**قات و قڕی نێوەمەلۆیان:** گرانییێکە لەکاتی دروێنەدا پەیدادەبێ.

**قاتی:** تێکەڵاو، ئاوێتە. گرانی، قات وقڕی، نێز، (باک.) دلاخێڤ، قاتەولێوە، گرانیێکی زۆر سەختە و دژوارە، کووڕی دەغڵ و دانە. داخووا، خووا حەز بکات. ـــ دروناکات: نیشانەڵلا دروناکات.

**قاتی وقڕی:** قات وقڕی، قاتی.

**قاجووج** (باک.): گچکەی وی قاجوچکە لەگڵی دروست دەکرێ بۆ ئاو پێ خواردنەوە.

**قاجیتی** (باک.): جوورە بووزوویێکە.

**قاچ** (کە.): پێ، لاق، پاوقول، قول. (زەن.) کەمەرئاسنین. (کە.) وورده بەردی سپی کە گەمەی قاچێنی پێدەکەن. (باک.) گیایەکە. (باک.) کلکی بزن و ڕەشەوڵاغ و ووڵاخی بەرزەیە. ئاوی نەخۆشی و دەردێکیشە.

**قاچاخ:** یاخی، سەربزێو. گامێشی سێ ساڵانە. ماڵێکە باج و سەرانەی میری لێ دەرنەکرابێ.

**قاچاخەرێ:** لارێ.

**قاچاخچی:** کەسێکە کەل وپەل و زیندەواری قاچاخ بکڕێ و بفرۆشێ.

**قاچان:** کەسێکە جرپن و بزۆزە. (کە.) بازەڵێن، (کە.) هەڵمەقۆ، یارییەکی منداڵانە، قاپێن. ـــ ی (باک.): جوورە قابێکە.

**قاچاندن:** دەرباز و قوتاربوون، کابرا قاچاندی: واتە دەربازبوو.

**قاچاو** (کە.): شوێنێکە ئاوی لێ گیرنەبێ، بلندایێکە ئاوی پێوە ڕانەوەستێ.

**قاچەشرمەکێ** (ئەردە.): جوورە گەمەیەکە بە پێ یەکتری بەرزدەکەنەوە.

**قاچک** (کۆ.، سنە.، باک.): کارگ. (دزە.) لاسکی گیاو ئیتر. خێزەرە.

**قاچ وقول:** لاق ولەتەن، پاوپل، پێ وپل، برێتییە لە ئەژنۆوە بۆ لای خواری.

**قاچ وقووچ:** دزی بەفڕوفێڵ.

**قاچ وقووچکردن:** دزی کردن بەفڕوفێڵ.

**قاچێن:** هەڵمەقۆ.

**قاچین:** هەڵپاچین، برینی لکی پتری درەخت و مێو و مووی سەر و ڕیش.

**قاحپە:** دەستما، سازندە، (باک.) قەحبک، سووزمانی، سووزانی، بۆل، جندە، بلح، سەڵیتە، ژنی حیز و سووک، ترۆ، خووارۆ. ـــ یی: حیزی، سووکی، جندەیی.

**قاخ:** چتی چەوتاوەوە، کووڕ، قووخ، چەمیاگەوە.

**قاخلی** (هەورا.): کاخلی گوڵێکە وە زەعفەرانی دەچێ.

**قاد** (باک.، ژە.): زەوی، مووچە، وولگە، ووڵات، قاج، ئەرد، دبێژن ـــ قادا خودێیە.

**قاده** (باک.): شەکرۆکە و شیرنیات سازی. (هەو.) دارێکە درێژە، کەشەغرە پڕ کرا بەوی قایم دەکرێت و هەر بە شەغرەکەوەیە.

**قادۆ**: قەدۆ کورتکراوەوەی (قادر)ین.

**قادێ** (زا.): مەیدان. (باک.) نێوی مرۆڤانە لەقادر کورتکراوەتەوە.

**قادوولک** (باک.): جۆرە ئامانێکە لە چینی دروستدەکرێ.

**قار** (باک.): خواردەمەنیەکە هەموو رۆژێ دەدرێ بە شاگرد و فەقێیان. (زا.) دەوی فەقێیان. (ئەردە.) قین، رق، رک. مووچەیێکە هەمیشە بدرێ بە هەژاران.

**قاراندن**: قارەکردنی مەڕ و بزن.

**قارە**: دەنگی مەڕ و بزنانە، بارە. دەنگ و قیرە و قرتەی مریشکانە. (ئەردە.) قیرەی قەلەڕەشەیە. دوادەنگ. ــ ی لێ برا: واتە دەنگی هەرە دوایی لێ برا. دواشوێن، دواشووێنەوار.

**قارەقار**: دەنگەدەنگی بزن و مەڕانە، قارەی یەک لەدوای یەکتری، بارەباری ئاژاڵ. دەنگەدەنگی مریشک و قازو مراوییانە. هاوار و قیرە و قیژەیە، (باک.) قارقار.

**قارەگوڵ**: گوڵە گچکەکانی پاشەرۆکێن.

**قارەمان**: ئازا، پاڵەوان، نەبەز. ناوی نێرینانە.

**قارەوانە**: قەرەوانە، لەگەن و ئامانێکی زۆر زلە بۆ ئەوەی چەند کەسێک نانی تێدا بخۆن.

**قارپچۆک** (زا.): مەردومی زۆر لاواز.

**قاربووز** (ئەردە.): سەر و کلاوی لامپا، قەرپووز.

**قارپۆز** (ئەردە.): قەڵپووزی زین. (ئەردە.) کاسەی لامپاو ئیتر.

**قارپۆززین** (ئەردە.): قەڵپووزی زینی.

**قارچ**: کارگ، قارچک. (باک.) دارە هەرمێ کێویلەیە.

**قارچە** (خۆ): قوولایی ژێر ئەژنۆی مرۆ و وولاخانە.

**قارچک** (کە.): کارگ، دۆمەلان. (باک.) هەرمێ کێویلەیە. رۆماتیزمی گەروو.

قارچک

**قارچکەگولانە**: قارچکە مارانە ناخورێ، چەتری مار.

**قارچکەمارانە**: کارگەگولانە.

**قارزنگ** (ئەردە.): قرژانگ.

**قارس**: قەڵس، کەسێکە لەچتێک یا لە کەسێکی وەڕەز بێ. (م.) شوورێنێکە لە کالاّ کە هەڵدروابێ بۆ کورت بوونەوەی. ــ بوون: قەڵس بوون، سەغڵەت بوون. ــ کردن: قەڵسکردن، تووڕەکردن.

**قارغ** (باک.): دەردێکی چاوانە هەرکەسێ دەردی وای لە چاوی دابێ بەڕۆژ باش نابینێ.

**قارقار**: دەنگی بەرزی گیاندارانە.

**قارقاروک** (زا.): قارپچۆک.

**قارک** (شن.): نێرتکی گیاو گولانە.

**قارگە** (کە.): باڵەییەکە لە ریزی هاوالان دووابکەوێ. شار، جێی شارە لە کەمەدا.

**قارنان**: قەرنان، چاولەدوو، بەرچاوتەنگ، چاڤکوور، (هەو.) مردار، مەندەمۆڕ. (باک.) ئاز، ئازوەر، جەڵە، مەندەبوور. دەستەیەکە لە یاری قەلەمرداریدا کە درەنگ تێ بکەوێ.

**قارنج** (ئەردە.): بابۆڵەپێچ، نەوار، پەراوێزی جل و بەرگی، هووت.

**قارووش**: کارووش، گیایەکی پەلک پان و لک باریک و لەبەژنێکی بڵندتر دەبێ و بەریشی وەکو کونجی وایە، پێشی هەلاّتنی گەلاوێژێ کە کارو بەرخ قارووشی دیمەکاری بخۆن مندار دەبن.

**قارووشە** (زا.): گەسکی پووش.

**قارۆقۆڕ**: بارۆبۆڕ، بالەبالی بزن و مەڕان.

**قارۆقوور**: قارەقاری زۆر، بارەباری ئاژاڵ.

**قاروومە** (باک.): گیایەکە.

**قاروون**: پەرچ، (هەو.) زەمەند، زەبەن، چڕ، بێشەی قەرقوو، جێگایەکە پڕ گیاو تێکچرژابێ. دەوڵەمەندێکی مێژوویی یە لەوانە هەڵبسترابێ.

**قاروونە** (ئەردە.): کرمی ناو میوەی ووشکەوە بوو، مۆرانە.

**قارێ** (باک.): (وەندێ قارێ و زەرمەحەن) ناوی بەسەرهاتێکی کرمانجییە بە شەڕ و گۆرانی دەبێژرێ، نێوی مرۆیەکیشە.

**قارێن**: یاری قەلەمرداریێ.

**قارێت** (باک.): مرۆڤی بێ هێز و لەڕولاواز و داڵگۆشت، قارێتک: گچکە کراوەوەی ویە.

**قاریسەک** (باک.): چەسپ.

**قارین** (باک.): پارانەوە، لالاّنەوە، بقارە: بپارێوە، بلاوێنەوە.

**قاز** (هەو.): بەلەبار هەڵکەوتنی هەلووکی دەڵێن لەکاتی کەوتنە سەرزەویدا. باڵندەیەکی سپی و گەورە و ملدرێژەو ناوی ومالّی و کێویش هەیە دندووکی پانەو لە مراویش گەورەترە.

قاز

**قازاخ**: جوان، شیرین و ناسک، نازدار، پاک و خاوێن. (ئەردە.) بێ ژن، عازەو.

**قازان** (هەورا.): مەنجەڵ، تیان، تیانە.

**قازانسەر** (ئەردە.): مەلێکی چنگداری بەهێزە سەری باڵندەی تری پێ هەڵدەقەنێ، ــ ە: قازانسەرە.

**قازانج**: سوودێکە لە کرین و فرۆشتنەوە دەست بکەوێ. داهات، هێ، بەهرە، سوود، دەسکەوت، دەستگیر، کەلک، هاڤل، هەو، کار، (هەورا.) سوو، (کۆ.) ئایە، (باک.) بەرخوەر، باو، بای، لای. ــ ی تێیە: باوی تێیە، بای تێیە، لای تێیە. ــ دار: پرسوود. بێ ــ : بێ سوود.

**قازانج بەنیوەیی**: کرین و فرۆختنی دوو یا چەند کەسانە بەسەر مایەی هەموویان بۆ ئەوەی کە قازانج بکەن بەدوو یا بە چەند بەشەوە.

**قازانج کردن**: سوودکردن، بردنەوە، کەڵک وەرگرتن، دەستکەوتنی قازانج.

**قازانج دەر** (هەورا.): مردەخۆر، سوودخۆر.

**قازانچە** (هەورا.): مەنجەلۆک، دیزە.

**قازانقوڵفی**: نێرو مێیەکە ئێخەی پێدا دەخرێ.

**قازەڕن** (باد.): برنجێکە داروجانی زۆربێ و نەدروێتەوە ناچار گوڵ گوڵ، هێشووهێشوو بەدەست دەیڕنەوە و لە کۆشی یا لە توورەکەیەکی دەکەن.

**قازەقاز** (هەو.): گارەگاری قازی و مریشکانە.

**قازەلاخ**: باڵندەییێکی بۆرە و لە چۆلەکەی گەورەترە میلێکی سپی بە گەردنی داهاتووە و لە دەشتێدا دەژی و گۆشتیشی دەخورێ، تەیتۆک، تیتک، تیتڵ، تیتی، قازەلاّخ، قازلاّخ، قازلاّخی.

**قازەوان:** شووانی قازان.

**قازلاخ** (ئەردە.): قازەلاخ، قازلاخی.

**قازم** (باد.): بەنێکە، کە لە کولک و خوری ڕێسرابێ.

**قازمانە:** میوەییێکی مەیلەو سوور و شیرینە وە قەیسی دەچێ، قەرەلوو، (کۆ.) قاسمانە. هەلووچە، هەلووژە.

**قازمەمکێ:** یەکێکە لەبەرەکانی دارەمازوو وەک دەنکە تەزبیح وایە.

**قازووچ** (باک.): باریک، لەڕ، لاواز، بێ تین.

**قازووخ:** سینگ، هۆرە، گولمیخ.

**قازووقولنگ:** قازوقولینگ، قازومێشمسی.

**قازومێشمسی:** قازوقولینگ.

**قازیاخە:** گیایەکی بەهارییە گەلای پانە بەکولاوی دەخورێ.

**قازیانە:** گیایەکی بەهارییە.

**قازی بازی** (خۆ.، کۆ.): جوورە قالۆچەیێکی بالدار و سەوزە، ووزووزە، زمزمۆک.

**قازی بەسەر:** پۆلیسی هات و چۆکردن.

**قازی قولنگ** (ئەردە.): قولنگ.

**قاژ** (جا.، هەورا.): قاژوو، گۆشتی دەخورێ، ڕەنگی وەکو قەلەڕەشەی وایە لە هەندێک شوێنان بە قەلەڕەشەی دەلێن خۆی ڕەشەو پێ و دندووکی سوورن. (لو.) قاشی برۆ. قیژە، قیرە، قرتە (بۆ مریشک و بالندانە).

**قاژە** (ئەردە.): دەنگ و کۆشەی گوللەیە. دەنگی قاژووی زۆر و قەلەڕەشان.

**قاژەقاژ:** قاژەی زۆر، دەنگی گوللە.

**قاژەک** (دەر.): تشقەلە.

**قاژر** (ئەردە.): گرینۆک.

**قاژقاژ** (باک.): قاژە، قارە، قیرەقیر، قرتەقرتە، دەنگەدەنگی بالندانە بە تایبەتی مریشکان.

**قاژقاژە** (کە.، دەر.): قاژوو.

**قاژک** (باک.): جیوەی دارێ.

**قاژوو** (موک.): قاقیشک، قەل، قاقیژە، (کۆ.) قەلەقاژ، (هەورا.) قاژ، قاژی، (کە.) قاژقاژە، قاژەڕەشە، بالندەییێکی ڕەشی کێوییە بەقەد بارۆکەیەکیە و دەشخورێ، پێ و دندووکی سوورە.

**قاژی** (هەورا.): قاژوو.

**قاس** (شکا.): کات، دەم، تاو، ــ ەک وەرە مالامە: تاوێکی وەرەمالی مە. (باک.) نەخت، هند، ــ ێک گەنم بدە من: نەختێکم گەنم بدەیە.

**قاسپە:** قپە، دەنگی خوێندنی کەوێیە.

**قاسپەقاسپ:** قپەقپ، قەبقەب، قەبووقەبوو، قەبۆقەبۆ، قەپەقەپ، دەنگەدەنگی خوێندنی بێ پسانەوەی کەوێیە.

**قاست:** حاست، جێگا.

**قاسک** (باد.): لاسکی گیاو دەغلاتە، (دزە.) قەد، قاچک، لاچک.

**قاسکێ** (باک.): دەمێکی، تاوێکی.

**قاسم** (باک.): گیایەکە.

**قاسمانە** (کۆ.): قەرەلوو.

**قاسناخ:** بڕوانە قەسناغ.

**قاسۆ:** کورتکراوەوەی (قاسم) ییە.

**قاش:** نەقێم، بەردێکی نرخدارە کە لەنەقیمەی ئەنگوستیلەی و نیتر دەگیرێ. کووزی کالەک و شووتی و نیدی، (ئەردە.) برشت. (موک.، دەل.) برۆ، قەفی کەوانەداری برۆیە. پارچە میوێکی لەتکراوە، شەقەمێو.

**قاشاخ:** بنجی گەفەشامییە کە گولەکەی لێ کرابێتەوە. (کۆ.) گیایەکە وەکو مێکوکییە بۆ چێغ دەستدەوات وە کەنگریش دەچێ.

**قاشاو:** شالێ، پەڕۆیەکی زوورە دووای ڕنگ کردنی وولاغ بەسەر ئەندام و لەشی دادێنرێ.

**قاشەماسی:** جوورە ماسیەکی دەستەیە.

**قاشتە:** جوورە ماسییەکە وەکو زەردەوایە بەلام ئەم پوولەکەی زلەو ڕەقە.

**قاشقاش:** چتی کووزکووز.

**قاشقونجی:** ئافرەتی جرهنی بێ شەرم.

**قاشکردن:** لەتکردنی شووتی و کالەک و چتی تر بەقاش.

**قاشل** (باک.): تێکولی شووتی و کالەک و چتی تر. لام وایە تیکولێ نیە بەلکو بەقاش و کووزی وان دەلێن.

**قاشم** (زا.): گیایەکی بۆنخۆشە.

**قاشنە:** جوورە ماسییەکە پوولەکەی زەردی ڕەقی پێوەیە.

**قاشۆ** (باک.): قەشە، کەشیش. (هەورا.) چەوگان، (بابا.) دارشەق، دارێکە یاری قاشوانیی پێدەکرێ.

**قاشۆمێو:** مێوێکە لقێکی کەمێک بە کۆلکەوە یا بە لەشی دارەکەوە پێیەوە دەبڕن، گلەماک، شەقەمێو.

**قاشووان:** شەقێن. ــ ی (هەو.) گۆیێن، چەوگانێن.

**قاشوولە:** قاشیلە.

**قاشوولک** (باک.): تێکولێ و پیستی دار.

**قاشیلانێ** (هەو.): گەمەیەکە.

**قاشیلە:** قاشولە.

**قاشیلکە:** قاشولە، قاشولکە، قاشیلە، لە تکەچینی گچکەی منداڵانن گەمەی پێدەکەن.

**قاغەز:** قاقەز.

**قافەنەک** (لو.): فرۆ.

**قاف:** قەفقاز، چیای ــ : چیای قەفقازێیە. (کۆ.) قافکە، ئالقەیەکە لەسەری گوریسان دەخرێت. (کە.) پێشمەرگەی زۆرپایی. ــ کردن: بەزۆر مرۆ کردنەپێشمەرگە. (باک.) قاب، کاسە. ــ ێ سەرێ: کاسەی سەری. ــ ێ گولان: گلێنە، کاسەی گولان. ناوی تیپێکی ئابێی کوردییە. هەل: لە ــ خۆی داگرتم: لە هەلی خۆیدا گرتم.

**قافقلۆز:** قاپ و قاچاخی گلێن.

**قافک** (باک.): گۆزەلە، سووالەت.

**قافکە** (کۆ.، خۆ.، زاخ.): قاف، هێچک، قولفەیێکە. لەسەری گوریسان دەخرێت.

**قافکردن:** مرۆ گرتن بۆ پێشمەرگەیی.

**قافڵە:** کاروان.

**قافڵەرێگا:** ڕێگای کاروان.

**قافڵەگا:** خان، کاروان سەرا.

**قافورۆ:** ناوی مرۆڤەکییە لە هێلا ئامودێ (عامودێ)، دەفرێکی پووشینە.

**قافوو** (باک.): ئاومالک، دارێکە، کە لافاو بیهێنێ.

**قافوور** (باک.): ژگوویرز، گوورزچی دکەن بێ کارێ خووە دکەن، گوورز: گیایەکە دڕکاوی پەلێ وی پان و درێژن دکوتن دکوتن و دخەنە سەر لۆدکێ حەرێی تاکوو لبەر ڕۆژێ زووا دبی ڕادکەن و بە کلسێ پتپت و نەخشا لێدکەن و کارێ خووە پێدکەن، دبێندەریدا گەمەک خویا دکەی.

**قافەڕەش** (زا.): جوورە کوولەکەیەکی ڕەش باوە.

**قاق:** قاقا، قاقێ، هێکە. (ئەردە.) ووشک، زڕ، میوە و دانەوێڵەی ووشک.

**قاقا:** تریقە، تریقەتریق، (ڕۆژ.) پرکە، دەنگی بەرزە لەکاتی پێکەنینێدا، بە ـــ پێکەنین: تریقانەوە، لە ـــ ی پێکەنین دان: تریقاندن. (باک.) ئێوی هێلکەیە، منداڵان بە هێکی دبێژن قاقا. (باک.) سەهۆڵ. (ئەردە.) ققە، تەقە، زاراوەی منداڵانە بە خواردنێ دەڵێن. ـــ کردن: تریقانەوە.

**قاقان:** پادشا، میر، گەورە.

**قاقانی:** (کە.) قەواڵە، (موک.) قەباڵە، قۆچان.

**قاقە** (ئەردە.): قاقا.

**قاقەز:** کاغەز، چتێکی تەنکی سپی و لووسە لە لۆکە یا لە پووش دروستدەکرێ بۆ لەسەر نووسینی. ـــ ی دێغ دێغ: قاقەزی خەتخەت.

**قاقەزی پەرداخ:** قاقەزی زمپارەیە، قاقەزێکە ڕوویەکی زوورە تەختە و ئاسنی پێ دەڕنرێ و خاوێن دەکرێتەوە و لووسدەکرێ.

**قاقب** (باک.): زفت.

**قاقجۆک** (باک.): گیایەکە.

**قاقری** (باک.): گەروو.

**قاقەیچک** (باک.): گەروو، (باک.) قاقری.

**قاقل** (باک.): کاکڵ، ناوی گیایەکیشە، تیکوڵی هێلکە و چتی تریشە، جوورە هەڵپەرکێیەکی منداڵانە.

**قاقلەجنۆکە** (هەورا.): چەقچەقۆکە، شەیتانۆکە، هێلکە شەیتانۆکە.

**قاقلەسۆنە:** قاتلسووینە، قەپانجەرە، باڵینە.

**قاقلۆک** (باک.): ئێسکی کاسەی سەری.

**قاقلۆکەشەیتان** (باد.): شەیتانۆکە.

**قاقلی بازان** (کە.): مەلێکە بەقەد کۆترێکییە.

**قاقم:** سموورەی سپی پێستی وی زۆر گرانبەهایە.

**قاقۆ** (باد.): ئێوی مرۆڤانە لە قاق، قاقا، هێک، وەرگیراوە.

**قاقەنەک** (فە.): ژەک هی هەموو گیان لەبەرێکی.

**قاقوم:** گیان لەبەرێکە وەسموورەی دەچێ پێستەکەی سپی و نەرم و زۆر گرانە.

**قاقیژە** (بار.): قاژوو.

**قاقیشک** (باک.): قاژوو.

**قاگەز:** قاقەز.

**قال:** پاک و خاوێن بوونەوەی زێڕ و زیو و کانانە بە تواندنەوە و داغکردنیان. ـــ کردن: پاک و خاوێن و بێ خەوشکردنەوەی زێڕ و زیو و کانانی تر بەهۆی تواندنەوەیانەوە. بێ شەرم، بێ ئابروو، سووراو، ڕووقایم. پاڵێوراو، پاڵفتەکردنی چتی تواوەوە وەکو ڕۆن. پوخت، سارد و گەرم چێژتوو، دونیادیتوو، ڕاهاتوو. قووڵ.

**قالاخ:** قەلاخی دەوە و تەپاڵە. ـــ ی (ئەردە.): کراسی ڕەش.

**قالاخی پۆش** (ئەردە.): ڕەشپۆش.

**قالان** (باد.): شیربایی.

**قالانقۆزیلێ** (هەو.): گوڵێکی زۆر سووری بەهارییە لەگوڵە باخ دەچی بەڵام لەوگچکەترە.

**قالاو** (هەورا.): قاژو و ڕەشە و دندووک و پێی سوورە و بە ڕەوت دەڕوا گۆشتیشی دەخورێ و لەشیشی ڕەشە.

**قالاوەبولینە** (ئەردە.): قەلەڕەشە.

**قالاوەڕەشە:** قەلەڕەشە گۆشتی ناخورێ.

**قالایی** (هەورا.): قەلەڕەشە. (ئەردە.) قەلایی.

**قال** (ئەردە.): بارەی بزنانە.

**قالە:** (قادر) ە و کورتکراوەتەوە.

**قاڵە:** قسەی زۆر ڕەق لەگەڵ دەنگ بەرز کردندا.

**قالەپێکردن** (کە.): پێ ڕاگەیشتن، تێ گەیشتن، پێ گەیشتن.

**قالەقال:** قاڵەقاڵی یەک لەدووای یەکتری.

**قالەقنگ** (ئەردە.): کالاقنگ، گەلای گیای ڕێواسی.

**قالب:** لەش، تەن، بەدەن، بەندەن، چەلم، بونیە، (ئاکۆ، بڵ.) قالک. قالبی قۆندرە و هەموو جوورە پێلاوێک و ئیتر. چوارچێوەیەکە چتی تێدا بڕێژرێ وەکو قالبی خشت. بەو دەرەجەیەش دەڵێن کە زێڕ و زیو و هەموو جوورەکانێکی تێدا دادەڕێژرێ. پارچە زەرییەکە، کە بە بەیار هێڵرابێتەوە بۆداچاندنی مەرەزە. قالبەسابوون.

**قالب تاق:** قالبێکە خووار وەکو تاق دروستکرابێ.

**قالبسووک:** ئازا، چوست.

**قالبگران:** تەنبەڵ.

**قاڵبوون:** ڕاهاتن، پوخت بوون، دەرهاتنی مەردوم، لەکارمەحلان بوون.

**قاڵتاخ:** دار یا ئاسنێکە، کە زینی لێ دروستدەکرێ. قەڵتاخ، داری نێو زینی.

**قاڵچە:** ئێسکە گەورەکەی سمت و کەفەلی گیان لەبەرانە. بە سمت و کەفەڵی مرۆ و وولاخانیش دەڵێن.

**قاڵس:** قەڵس. ـــ بوون: قەڵسبوون. ـــ کردن: قەڵسکردن. ـــ ی: سەخڵەتی.

**قالک** (ئاکۆ، بڵ.): لەش، قالب، (باک.) کەڵەباب، سەدەف. (زاخ.) تووێکڵی گوێز و چتی ترە. قاووغ، قەپیلکی کیسەڵ و ڕەقە و ئیتر و کاسەی سەر.

**قاڵکراو:** پاڵێوراو، پاڵفتەکراو.

**قاڵکردن:** پوختە و زرنگاندنەوەی ڕۆن. لە کاروباردا ڕاهێنان.

**قاڵمەقاڵ** (ئەردە.): قارەقار، قولاقول، قاڵەقاڵ، قاورقوو.

**قاڵنگ:** دارێکی درێژی قولابدارە بۆ داگرتنی هەناری بەکاردەبرێت.

**قاڵنگە** (هەورا.): (ڕەوا.)کنۆرە.

**قاڵنگەبەن:** گوڵۆڵەی بەنی.

**قالۆ** (زا.): خشتێکە لەسەر ئاوور دادەنرێ و نانی پێ دەبرژێنرێ. (دزە.) یەک پشوو غاردان، جوورە غاردانێکە بە یەک پشوو ماوەیێکی ببڕێ.

**قالۆچانێ** (هەو.): جوورە گەمەیەکە.

**قالۆچە:** قۆلاچە، (زەن.) قالۆنچە، کێز، گووگووێرک، گووگێر.

**قالۆچەسوورکە:** (موک.) بەرسوورکە.

**قالۆچەی باڵدار:** گێزیک.

**قالۆچەی داران:** سپەلێک.

**قالۆر** (هەو.): قاتۆر، (ڕەوا.، خۆ.) قاپوور، تەنها بەلاسکی گیایان دەڵێن بە بێ لق و پۆپەی کە ووشکبێ و کلۆربێ و درێژ، لاسکی گیای کەمکۆڵ. ــ ی کەنگری: نێرتکی کەنگرییە، ڕنک.

**قالۆرە:** لاسکی چاوبارە.

**قالۆنچە:** قالۆچە، داعبایەکی ڕەشی چنگ چنگە و کەلێ جۆری هەیە هێندێکیان باڵدار و هێندێکیان بێ باڵن، گوخلێنکە.

**قالووشک:** تێکوڵی داران، وپیستەکەی.

**قالووچ** (باک.): قالووچک، داس، داسی گچکە.

**قالوون:** قەلوون، قەلیان.

**قالی** (هەورا.): مافوورە، ژێرەخەرێکی تەنراوی تووکنی نرخدارە، فەرش. نازایی. بە تووانوەوەیی و پوختی و پاکی. (هەورا.، کە.، فە.) مافوورە.

**قالیچە:** خالیچە، مافوورەی گچکە.

**قام:** مەقام، گۆرانی، ستران. (باک.) قوللەی کێوی. (باک.) بەژن و باڵا، قەد. (باک.) پا: ئەڤ ئاڤ ــ نادە: ئەو ئاوە پانادا.

**قامە** (باک.): قەمە.

**قامچی:** (باک.) تازانک. چەرمێکی هۆنراوەیە بۆ لێدانی وولاخی سواری و مرۆڤان بەکاردەبرێ لە تێلێش دروستدەکرێ.

**قامر** (باک.): قامیش، گیایەکیشە لەبەر ئاوێ شین دەبێ، بەنی قامر کوردان لەوی دروست دەکەن وەکوو کەندرێ وایە، بەلاّن زەردە.

**قامک:** ئەموست، ئەنگوست، ئەنگوس، تل، تپل. (یەز.) تلیک، (فە.) کلک، گلک، (باد.، باک.) تلهە، تلی، (سوو.) پەل، (هەورا.) ئەنگوس، گلک، (زاخ.) تپل، پتک، گوست، (کە.، بابا.) پەنجە، (دەر.) پەنجک، (گۆ.) پتلیوی، (بار.) تپلک، ئەموست، تلک، تیلک. قامکەگەورە: (باک.) بەرانەک، تلیابەرانێ، (بار.) تپلابەرانێ، بەرانکێ، (دەر.) کەڵە، پەنجەکەڵە. ــ ە گەورە: ئەسپێ کوژە، تلیا بەرانەکێ تلیاگرێ، تلیاگردێ، کلکەگەورە. قامکی شادە: (خۆ.) شادەبێژ، دژشاوەژە، تلیا هلاڤێژکێ، تلیا دالاّستۆکێ، تپلاشادێ، شادەنووێژ. هەلەقووتە، قامکی ناوەندێ، (خۆ.) دژلەدرێژ، تپلانیڤەکێ، ناڤچار. براتووتەڵە: (خۆ.) بابەلیچک، (باد.) تلیابار قلیچک، بابەلیچ، مامەلینچک، براقچ، دلێ راسینێ، تپلکێ رۆخێ. تووتەڵە: (خۆ.) قلیچک، (هەو.) قولیچک، (باد.) قلیچ، (بار.) تپلاقلیچێ، قچ، قچیلک، قامکەتووتە، تلیاقلیچکێ، (هەورا.) کلکەپووتە.

**قامکەبەن:** هەڵکردنی گلۆڵەی بەنە بە ڕاست و چەپە لەسەر باری درێژی.

**قامکەچکۆڵە:** تووتەڵە، قولیچک.

**قامکەسووتەڵە:** شۆرباوی ماست و ڕۆنییە.

**قامکەوانە:** ئەنگوستیلە.

**قامکی براو:** ئەمووسی براو، تپلی براو.

**قامکی شادە:** قامکی چوارەمە لەنێوانی قامکی ناوەندی و قامکە گەورەیە.

**قامکی قوونێ:** ئەرنەموتێ، قامکی ناوەندێ.

**قامکی گەورە:** تپلامەزنە.

**قامکی ناوەندێ:** قامکێکە لەنێوەڕاستی قامکی شادێ و براتووتەڵەیدایە.

**قامووشک** (باک.): قرتاغی برینان.

**قامیش:** (هەورا.، جا.) زل، قامر، لەقەن پیکە. (باک.) قەمیش، بروو، پروو، لیلک، زەل (پتر لەناو ئاوێدا شین دەبێ)، نەی، زەل، ئەیجە، گیایەکی بالاّبەرزی قەفقەفی ڕەقی ناو کلۆری گەلاّپانە. سیرەتی نێرینان، کیر، چوو، چووک، بۆنێرینەی مرۆڤان. (گەرمێن) بەرماغی جگەرەی.

**قامیشە** (خۆ.): قرقرۆچکەی گەروویە.

**قامیشەلاّن:** قامیشستان، شوێنێکە قامیشی زۆربێ، هەوینگ.

**قامیش بەند:** ڕیزی قامیشی ڕێکی چنراو.

**قامیشلی:** قامیشلۆکێ: شارێکی کوردانە لەژێردەستی سووریە دایە شاری نسێبینیش کە بەوەوە بەستراوە کەوتۆتە ژێردەستی تورکان.

**قامیشی چیغی:** کرتوو.

**قامیشی شەکری:** جوورە قامیشێکە شەکری لێ دروست دەکرێ.

**قان:** قانگ لە پووتی تەوور (بۆ تەوور). (سوور.، جا.) مۆڵەت، نۆبەت، (کۆ.) فڕ، جار، لە گەمەو قومارێدا دووای بردنەوە یەک دوو دانەیەک بە دژ ڕاوەکە دەدرێتەوە بەنێوی دەستگرتن کە پێی بکاتەوە بەوە دەڵێن قانی دایە واتە دەستی گرت.

**قانە** (عرا.): قەدی خام و بلووری و نیترە لەجیاتی ئەوەی کە بەگەز بی پێوَن بە قانە ڕێک دەکەن، یاردە.

**قانبلا** (خۆ.): پێویست، گەرەک.

**قانتر** (باک.): ئێسترە دایکی وی ماینەو باوکیشی کەرە.

**قانتووف** (باک.): سەوەتە.

**قانج** (باک.): ئەستوور، زبر، زوور.

**قانچە** (باد.): جێگایەکە لەسەر دیواری و کەمێک بڵند کرێ یا نەکرێ سەری کاریتەی لەسەر دادەنرێ، گوێسووانە.

**قانچک** (باد.، بۆ.): داسوو، قەلداس، قانچە.

**قانەلووک** (باک.): شاکاشی، قابی گڵە کە ماستی تێدا ڕەنیو دەهێنرێ.

**قاندڕ** (خۆ.): گرووی منداڵان. (شن. ، کۆ.) دوژمن، خوێنڕێژ، زاڵ، کەلەگا، زۆردار، بارام ـــ ی پیرۆزتییە واتە پێی فێرە و بەزۆری هەموو چتێکی لێ دەستێنی. (دزە.) مەراق، هەرەس.

**قانزاج:** قازانج. ـــ بەنیوەیی: قازانج بەنیوەیی.

**قانزاجکردن:** قازانجکردن.

**قانقان** (باد.): ڕەشانک، خاڵخاڵ.

**قانگ:** (ئەردە.) خەربەنگ، (کۆ.) قەم، پووت، کاوێ، تووری ـــ : تورێکە ناوەکەی خاو و پووت بوویێتەوە. خەفەکردن و دووکەڵدانی ڕێوییە لە کوندا، بە دووکەڵ ـــ دان: خەفەکردن بۆ هەموو گیان لەبەرێک. (بابا.) برکی قانگ، گیایەکە وە ڕێزەڵەی دەچێ وە بەرەکەشی وەکو نۆکی وایە. (ڕەوا.) ـــ ی توور. برینی کۆن.

**قانگە** (شار.): کانگە، بناغەی خانوو.

**قانگەلاشک:** قەنگەلاشک، گیایەکی گەورەو بەرزە کە بەلاسک و لق و پۆپەوە ووشک بوویێ، نێرتکی کەنگرییە کە بە دڕکەوە ووشک بوویێ.

**قانگەڵە:** قانقڵە.

**قانگدان:** بە دووکەڵ و چتی تر خەفەکردن، جارێکی تریش قومار کردنەوە لەگەڵ یەکێکیدا کە دۆڕاندبێتی.

**قانگەڵ:** ـــ ی بەن و دەزوو و ئاوریشم ئەوەیە کە لە پەنجە دەهاڵێنێ دوایە هی تری لەسەر هەڵدەکەن واتە لەسەری قامکی گەورە و تووتەڵە دەئاڵێنری و هەڵدەکرێ.

**قانون:** دەستوور، ناوی ئامرازێکی مۆسیقایە.

**قاو** (فە.): بسک (هی ئافرەتان). بانگەواز، دەنگ، چرە، بڵاو: دەنگ و باس قاوە: واتە بڵاو بۆتەوە. بە پشتی پێ لەقە وەشاندن. (کە. ، هەو. ، کۆ.) پووشووی داری، (سوور.) پیشوو، پیفو.

**قاوان** (باک.): قەوانەیە کە دەنگی خۆشی لەسەر تۆمار دەکرێ.

**قاوە:** گیایەکە بەرەکەی وەکو نۆکییە خڕ سەوزە دەکوترێ و بۆ دەدرێ وەکو چالێدەنرێ و بە فینجان دەخورێتەوە. دەنگ و باس بڵاوە.

**قاوەبرێژ:** دەفرێکی تایبەتییە قاوەی تێدا دەبرژێنن.

**قاوەتوون:** قاوەڵتی، نانی چێشتانێ.

**قاوەتی** (هەورا.): قاوەتوون، قاوەڵتوون، نانخواردنی پێش نیوەڕۆیە.

**قاوەجاخ:** شوێنێکە قاوەی تێدا لێدەنرێ.

**قاوەجۆش:** گومگومەی قاوەیە.

**قاوەچێتی:** چایچێتی.

**قاوەچی:** چاچی، چایچی، کەسێکە هەر قاوەی لێ بنێ.

**قاوەخانە:** شوێنێکە قاوەی لێنراوی تێدا بفرۆشرێ بۆ چایخانەش بەکاردەبرێ.

**قاوەخۆرەوە:** تیرەیەکە لە بڵباسەکانی بیتوویێنێ.

**قاوەدان:** قاوەتێکردن بۆ خواردنەوە. گومگومە، ـــ ی سەرئاوری: دەلە.

**قاوەڕەنگ:** قاوەیی.

**قاوەسینی:** سینیەکی گچکەی تایبەتییە قاوەی لەسەر دەگێڕن، ئەم ووشەیە دووپارچەیە هەر چەندە پارچەکان تورکی نین بەلاّن شێوەی داڕژتنی تورکین.

**قاوەقاو:** هەراهەرا، چراوەچراو، کاڵەکاڵ، دەنگەدەگ، چاووڕاو، بانگەبانگ، تووڵەتووڵ، تووڵا تووڵ، قاووقوو، دەنگەشە.

**قاوەڵتوون:** قاوەڵتی، قاوەتی، فراڤین، تێشت، نانی چێشتانێ، تەهێشت، چێشتەنگاو، قەرەتوون، نێوەڕاستی ماوەی بەیانی و نیوەڕۆیە.

**قاوەڵتی:** قاوەڵتوون.

**قاوەیی:** هەڵوایی، ڕەنگی قاوەیی، قاوەڕەنگ، (هەورا.) سویات، (باک.) پۆڕڕەش، چتێکە ڕەنگی وە ڕەنگی قاوەی برژاو بچێ.

**قاوبڵاوە:** دەنگ و باس بڵاوە، چاووڕاو بڵاوبۆتەوە.

**قاووت:** (کە.) قاویت، (باک.) کاویت، (ڕەوا.) پۆخین، ئاردی دانەوێڵەی برژاو و قەرەخەرمانە.

**قاوتاندن** (زا.): قاوردان.

**قاوت و ڕۆن:** قاووت و ڕۆنی کەرە تێکەڵ دەکرێن و خواردەمەنیەکی خۆشە.

**قاووخ:** قابوخ، قەواخ، قەباخ، تیکوڵی بەڕوو و بادام و گوێز و کیسەڵ و ڕەقە و ئیتر.

**قاووخە:** گیایەکە.

**قاوداخستن:** دەنگ و باس بڵاوکردنەوە.

**قاودان:** پاسدان، دەنگدان، دەرکردن، دوورخستنەوە.

**قاوکردن:** بانگ کردن، گازکردن بەدەنگی بەرز، چڕین.

**قاولەمە** (ئەردە.): تاسکەبابی. قابڵەمە، مەنجەڵۆکی گچکەی سەرپۆشدارە. (ئەردە.) خواردەمەنێکە، کە بۆ سەیران و گەڕان دەیبەن.

**قاوور:** قاپوور.

**قاوورمە:** گۆشتی سوورکراوەوە کە بۆزستان هەڵدەگیرێ، (باڵە.) قیێ.

**قاووغ:** قاپوور.

**قاووقریشک:** قیژ وهۆڕ، دەنگەدەنگ.

**قاووقوو:** قاوەقاو، قولاقول، قوولە، هەراهەرا، قاڵەقاڵ.

**قاووقیژە:** قاوقریشک.

**قاویت** (کە.): قاورت. (باک.) لە ئاردی کولاّو دروستدەکرێ دۆشاو و شەکریشی تێدەکرێ هێندێک ڕۆنیشی تێدەکەن و هێندێکیش بێ ڕۆن دەخۆن.

**قاوێر** (باک.): دەورەی هەر چتێکی بێ، هاوێرە، دار، دۆر.

**قای** (زا.): تیپی پرسیارە.

**قایەخ:** دەستەکەشتی، لۆتکە، کەشتی چکۆڵە، جوورە بەلەمێکە لە ئاوێدا پێی دەپەڕنەوە.

**قایەخەوان:** کەسێکە قایەخی باژووێ.

**قایمە:** کەپرێکە لەناو حەوشان و باغاندا بۆ دارە مێوی دروست دەکرێ تا پێی هەڵچی.

**قایش، قاریش:** پشتێندی چەرمینەو پتەو و بەتینە.

**قاییش:** پانێر، پارێن (گوێرەکەی پار). پێست و چەرمی خاراو و خۆشکراوی ڕەنگ کراوە.

**قاییش پێ کێشاندن:** قایل نەبوون، قۆڵ نەکێشان.

**قاییشکێش** (باک.): لاگر، لایەنگیر. (باک.) ـــ ی: لاگری، لایەنگیری.

**قاییل**: ڕازی، چاوتێر، (باک.) بەششین. ـــ بوون: بەششین. ـــ کردن: بەششاندن. نا ـــ بوون: سەرلەقاندن، سەرهەژاندن. ـــ ی: ڕازیەتی، چاوتێری.

**قاییم**: ڕەق، پتەو، پکێت، مەحکەم، توند، پاڵەپاڵ، سەخت، جەخت، قرار، کۆرس، ستوور، کرار، کەیار، دووباد، بەهێز، پایەدار، ڕاوێسیاگ، سفت، پاوەجێ. ـــ بوون: تەقزین، گووریخ. لیێ ـــ کردن: تێخستن، لیێ قایم کردن. ـــ کردن: تەقزاندن، ڕاگیرکردن. پێوەدراو، داخراو، ژەنیاگ، بەسیاگ. شاردراوەوە، شاریاگ.

**قایمە** (ئەردە.): هیچ بەهیچ لەکاتی شەترنجێدا بەکاردەبرێ کە هیچیان نەیبەنەوە. پتر، زۆرتر، زۆرمە، زۆربە. خۆ کۆکردنەوە و ئامادەبوون بۆ چتێک، دارا خەریکی ـــ یە. کاتی تەنگانە، دانەوێڵەکە دەست پێوەبگرە بۆ قایمە، زۆربەی چت قایمەی لە شەکرەکە هاتووە. یاساو دەستوورێکە، کە لەیاری دامە و شەترنجێدا هیچ کەس نەیباتەوە یا هیچ لایەک نەیبەنەوە. ـــ ی مێوێ: دێلی، ماهشەل.

**قایمکار**: کەسێکە چتی باش و قایم هەڵگرێ. ـــ ی: چت باش و قایم هەڵگرتن.

**قایمەکردن**: قایمەکاری.

**قایم کردن**: بەستن، ژەنن.

**قایم بوون**: پتەوبوون، جێگیربوون.

**قاییمکار**: قایمکەر، کەسێکە چتی قایم کات یا کاروباری پوخت بێ یا چتی گرانبەها بشارێتەوە.

**قاییمکردن**: سفت کردن، پاوەجێ کردن. توندکردنی تایەو بار و چتی تر، چتەکانت قایم هەڵگرە. شاردنەوە، پەنهانکردن.

**قاییم نوویژ**: کەسێکە نوویژی نەچێ. ـــ ی: نوویژ نەچوون.

**قاییمی**: مەحکەمی، پتەوی، توندی وبەهێزی چت.

**قە** (باک.): قەت، هیچ کاتێ، هەرگیز.

**قەب** (باد.): زۆرانی، زۆرانبازی.

**قەبا** (باک.): بڵندکردنی دەنگە، یا هەر بڵندکردنە. (زا.) قەبە. (باک.) کەوا.

**قەباخ**: قابلۆغ، قەواغ، سەرپۆش.

**قەبار** (کە.): تووێژی سەربرینان، قرتماغە.

**قەبارە** (موک.): بارست، بارستایی، بارسای، هێندە، ئەندازە، چت. (دزە.) سەپان کە بەپارە کار بکات. (هەورا.) تیەن، بارست، قەوارە، تەلاقەت.

**قەباڵە**: تۆجان، قەواڵە، قاقانی، نووسراوێکی مۆرکراوە لە خریدو فرۆشتن دەدرێ بە یەکتری. لەمل گرتن، وەئەستۆی خۆ گرتن.

**قەبە** (باک.): فش و زەلام و ناقۆڵا، چتی زل و ناشیرین، لەندەهۆر.

**قەبەدەیی**: مرۆی قەبەو ناقۆڵا.

**قەبەیی**: زلی وناشیرینی.

**قەبران**: دەخڵ ودانێکە چاک ڕسکابێ و باش هێزی گرتبێ.

**قەبرەخە**: قەبرغە. گەبرگە، قەبرغە.

**قەبرغە**: قەبرخە، لاپەراسوو، قەوورخە، چەمک، کەنار.

**قەبز**: گرفتیار، دڵتەنگ، گیاندارێکە ڕەوان نەبێ.

**قەبزە**: قەوزەی ناوئاو.

**قەبزەنوشتە**: چتێکە کەسێ سووچی نوشتابێتەوە.

**قەبزی**: گرفتداری، دڵتەنگی. ـــ پاییز: نیوەڕاستی پاییزێ، زۆرتر بە مانگی هەرەدووایی پاییزی دەڵێن.

**قەبقەب**: کەوشەدارینە، قاپقاپ.

**قەبقابک** (باک.): جوورە گیایەکە.

**قەبقەب** (باک.): دەنگی کەوێیە، قاسپەقاسپ.

**قەبقەبۆ** (باک.): لاسایی دەنگی کەوان کردنەوە، قاسپەقاسپ.

**قەبقەبۆک**: گیایەکە بەرێکی خڕی ووردی سووردەگرێ.

**قەبلاندن**: ئەندازە دانان بۆ چتێک لە بابەت نرخییەوە یا چەندێتییەوە.

**قەبلین** (باد.): پێگەیشتن و بە خۆداهاتنی کشتوکاڵ.

**قەبۆقەبۆ**: قەبووقەبوو.

**قەبووقەبوو** (ڕەوا.، بار.): قاسپەی کەوێ، قەبۆقەبۆ.

**قەبوقەبوو** (باد.): ووتەیەکە بەکاردێنرێ لەکاتی داواکردنی زۆرانی گرتن و شەڕێدا واتە وەرە مەیدانێ.

**قەپ** (فە.): قەپاڵ، گاز. ـــ لێدان: قەپاڵ لێدان (بۆ وولاخانە لەکاتی ئالیک خوواردنێدا).

**قەپاڵ**: قەپە، گاز. ـــ لێدان: گازگرتن، گەزتن. قەپ. ـــ لێدان: قەپگرتن لە چتێک.

**قەپاڵە** (هەورا.): باپۆڵە.

**قەپاڵگرتن**: قەپگرتن، گازگرتن.

**قەپان**: تەرازووی بەنناییە، پایەیەکە وە تاق بچێ. تەرازوویەکی زۆر زلە یەک یا چەند تایەکی پێکەوە پێدەکێشرێ واتە چتی قورسی پێدەکێشرێ، قاپان، کێش. (خۆ.) لکەدارێکە لەبنەڕە تێرا لیێ بووبێتەوە یا بڕابێ.

قەپان

**قەپانجەرە**: بالینە.

**قەپانچەرە**: قەفانجەرە.

**قەپانچەلە**: قەفانجەرە.

**قەپانچی**: کەسێکە چتی لە قەپان بدات.

**قەپاندن** (هەو.): ڕفاندن، فڕاندن.

**قەپاندنەوە**: خوواردنی هەندێ چت بە لاویچ وەک قاووت و برێشکە.

**قەپانکردن**: لە قەپاندانی چت، هەڵچنینەوەی ڕووی دیواری ڕووخاو.

**قەپانن**: فڕاندن، ڕفاندن.

**قەپانی**: کرێیەکە لە بەرانبەر لە قەپاندان و کێشانی بار و چتی تر دەستێنرێت.

**قەپەقەپ** (هەو.): قاسپەقاسپی کەو و کارەگاری مریشکانە. (باک.) تەقتەقیلە.

**قەپەقەپچێکەر** (باک.): قاپقاپساز، قاپقاپ دروستکار.

**قەپەنگ**: ئەو جوورە دەریچە و پەنجەرانەن هەڵدەدرێنەوەو دادەدرێنەوە.

**قەپچاندن** (باک.): هەوڵ و تەقەلادان.

**قەپچل** (دەرس.): دزێو، ناحەز، کرێت، ناشیرین.

**قەپچین** (باک.): هەوڵ و تەقەلادان.

**قەپداگرتن**: برێتییە لە داواکردنی ئەندازەیەکی زۆر لەنرخی چتێکیدا.

**قەپرخە**: قەبرغە.

**قەپقەپۆک**: گیایەکە وەگوێتی دەچێ ناوی پووک و چۆلە منداڵان لەناو چاوانی خۆیانی دەدەن، دەتۆقێ، هەپەپۆک، تیوڵتەقێنە.

**قەپک** (سع.): کورک (مریشک).

**قەپگرتن**: گازگرتن.

**قەپلاخ**: جۆرە کلاوێکی تووکنە لەپێستی بەرخ دروستدەکرێ.

**قەپۆز** (هەورا.): لمبۆز، لموز، لمۆز، ئەو بەشەیە لەدەم و لووتی وولاخان کە لەکاتی ئاو خواردنەوەدا دەچێتە ناو ئاوەوە بەدەم و لچ و لووتی وولاخان دەڵێن. دەم و لووتی هەندێ گیاندار.

**قەپۆل**: بروانە: قەپۆلە.

**قەپۆلە**: مرۆی دزێوی دەم وچاوناڕێک.

**قەپۆلکە**: ترێزوو و خەیار و باییبنجانی هەڵکۆڵراوە لە هاوینێدا ووشک دەکرێتەوە بۆ دۆڵمەی زستانێ.

**قەپوو**: چمۆڵە، قاووغ، قەپێلک، ـــ ی ئەم بەرووە فرێدە.

**قەپووبڕ** (ئەردە.): قات وقڕ.

**قەپووچک**: قەپووچکە.

**قەپووچکە**: قاپووچکە، پارووی نیوەلوول دراو تا شیرو ماست و دۆشاو و شلەمەنی پێ بخۆن وەکو کەوچکی قەپووچک. قەپووشکە، کیفی بەڕوو و جەفت. کەپولە، کاسەییێکی دارین یا نیدیکەیە ئاشەوان مزاشی پێ هەڵدەگرێ.

**قەپووچکەی بارانە**: بڵقێکە لەکاتێکیدا سەر هەڵدەدا کە بارانە بەسەر زەوییەکی تێراودا ببارێ.

**قەپووشکە** (ڕەوا.، خۆ.): شەیتانۆکە، قەپووچکە، بە تێکوڵەکەی دەرەوەی گوێز و بەڕووی دەڵێن.

**قەپووقڕ** (کە.): قاتوقڕی نێو مەڵۆیان، گرانێکە لەکاتی درونەکردنێدا سەرهەڵدەدا.

**قەپوقڕ**: کش ومات: منالەکان هەموو ـــ دانیشتوون.

**قەپووک**: قرپۆک، مێوژی وشک هەلاتوو. ★

**قەپوولک**: پاشقوڵ.

**قەپوولکە**: تاسمە، قاشە کاڵەک و کوولەکەی وشکەوە کراو. ★

**قەپێلک**: ـــ ی گەنم و جۆ و نیتر، کیفەکەیانە، کە دانەکەی تێدایە، کاپک. (ڕەوا.، دەر.) تیکوڵی هێلکە و گوێز و بەڕوو و نیتر. (کۆ.) پیلووی چاو، پەلکی چاو.

**قەپێن** (هەو.): ڕفێن، ڕفێنەر، ئەو کەسەیە چتی دەڕفێنێ.

**قەپین**: قەپان، قەپاندن.

**قەت**: هیچ کاتێکی، هەرگیز. (باک.) پارچە، بەش. ـــ کردن: بەشکردن، جووێ کردنەوە.

**قەتا** (باک.): پاک، خاوێن. ـــ کرن: پاک کردنەوەی دەخل و دانە بە بێژنگ و نیتر. (باک.) دارێکە، کە بۆ ووشک کردنەوە هەڵگیرێ.

**قەتب**: کۆڵ، بارام گاسنەکەی ژ قەتاب کەتیە: کول بووە. بارام گێسنی خۆ ـــ کریە: پارچەی خستۆتە سەر و چاکی کردەوە.

**قەتار** (هەورا.): کاروانی وولاخی بەرزە کە بەرودووا بڕۆن، ڕزن، ڕەسە. ـــ ڕێگای ئاسن: ڕێزە ژوورێکی. ئاسنین تێکخراوە مەکینەی ڕاکیش بەسەر ڕێگای ئاسندا ڕایان دەکێشێ. یەکێکە لە (١٢) بەندە کۆنە خۆشەکانی کوردی.

**قەتارە**: چتی بەڕێز وەستاو، وەکو ڕێز بەستنی قاز وقوڵنگ و چتی تر. بانەسەرە، پارچە خشڵێکی ژنانەیە لە زێڕ یا زێو دروستدەکرێ پێچی سەریانی پێدەڕازێننەوە، (موک.) بەرە. فیشەکدان. (باک.) کەژوورێکە بارو سەرباری پێ لەسەر پشتی وولاخ قایم دەکرێ. خشڵێکە لەزێڕ یا لە زێو لەقەراخی کڵاوی ژنان دەدرێت.

**قەتارەبەستن**: ڕێزبوونی گیاندار بە بەرودووا.

**قەتارچی**: کەسێکە، کە ئاگاداری قەتاری وولاخان بکات، کاروانچی.

**قەتارەکردن**: ڕێزکردنی چت.

**قەتارکێش**: ئامرازێکە بەقەد ژوورێکی قەتاری بەسەر ڕێگای ئاسندا ڕادەکێشێ.

**قەتاندن** (باک.): بەشکردن، برین، قرتاندن.

**قەتەتاوێر** (ڕۆژ.): قاتەتاوێر، زنجیرەی تاوێر، تاتە، تاوێر.

**قەتران**: تیژاوێکی زۆر ڕەشە.

**قەتریب**: ئالاڤەکە لە کەرەستەی جووتیدا.

**قەتشک** (باک.): تیشک، ڕووناکی.

**قەتک** (باک.): پارچە، هاروێی دیمەکاری.

**قەتماخە**: قرتماخ، قەتماغە، تووێژی سەربرین.

**قەتمەر**: مۆری تێر.

**قەتێ** (هەو.): (باد.) قتک، کەت، (موک.) کوڕکوڕە، کەرەواڵە، ترەوەژە، بەڕەوورێکی گەرمیانی هەژاری کونجرە بەقەد کۆترێکیە گۆشتی خۆشە. نێوی ئافرەتانیشە. کوڕکوڕە (باڵندە).

**قەتیان** (باک.): بەشبوون، شکان.

**قەتیە**: قەتێ.

**قەتیز** (ئەردە.): قەتیس.

**قەتیس**: چاوەڕێ، دەستەوەستان، داماو، کەسێکە، کە لەسەر کارێکی دامابێ، قەتیس بوون، دامان لەسەر کارێک. ـــ کردن: بەندکردن، دەستەوەستانکردنی کەسێکی لەسەر کارێکی.

**قەتین** (باک.): بەشبوون، شکان.

**قەجەر**: ئیلێکی تورکمانە، شاهەنشایەکانی قاجار لەوانن. ـــ ی: سەر پۆشێکە بەسەر سەریاندا دەدەن، لە بن چەنەگەکەیان دوو لچکی بە دەرزیلەی تایبەت دەکەن ڕوویان دیارە. (فە.) لووتەوانە، جۆرە کورتانێکیشە هی کەران.

**قەجەلە** (بان.): قشقەڵە.

**قەچاخ:** قاچاخ. ـــ چی: قاچاخچی.

**قەحپە:** ئافرەتی سووزانی. ـــ خانە: شوێنێکە ئافرەتی سووکی زۆر لێ بێ.

**قەحبک:** قاحپە.

**قەحفک** (باد.): قاپ و قاچاخی گڵێینی.

**قەخ:** قخ، کخە.

**قەخە:** قخە، کخە.

**قەد:** شەق، لەت. ـــ کردن: شەقبوون، لەت بوون. (زەن.) کن، لا، نک، هاین لە قەدیان: لەکنیانین. (ئەردە.) تیر، تووز، باڵا، بەژن، ئەندام، گژ، درێژی، بۆ گیانداران و درەختان، نێوقەد: کەمەر. ئەندازە، هێندە، بەرتەقا، بە ـــ ئەوە: بەئەندازەی ئەوە. بەژن، ـــ ی داران: کۆچ، وێلک. باڵ، بەرقەد، قەدپاڵ، بەرقەدی کێوان. قانە. دەستە، قەدێکم جلک بەڕادان داوە: دەستە جلێکم بە دروون داوە. لەت، بڕین. ـــ کردن: تەرەفاندن، پەلکردن، بڕین، هەڵپەرتاوتن، بۆدارو بارو چتی وا. چەند دێراوێکە، کە ئاوبڕیان لەیەک جۆگەوە بێ. دەق: لەسەر ـــ ی خۆی داینێ. چین. قەت، هەرگیز.

**قەدا** (باک.): چارەنووس.

**قەدارە:** شیر، شمشیر، قەیارە.

**قەداندن:** تەواوکردن، کۆتایی پێدان، ئەنجام پێ هێنان.

**قەدەح:** گوڵی پرتەقاڵ و لیمۆ و نارنجییە.

**قەدەخە:** قەدەغە، بەند، قۆرخ، یاساخ، پاوان، بەربەست. ـــ کردن: قەدەغەکردن، نەهێشتن.

**قەدەخە:** دارستان یا پووش و پاوەنێکە، کە خاوەندی نەیەڵێ دارەکانی ببڕێ و لە پاوانەکەش وولاخ و ئاژاڵی تێکرێ، پاوان.

**قەدەغە:** یاساخ، قۆرخ. ـــ کردن: نەهێشتن و توخونکەوتنی یەکێک بەلای چتێکا.

**قەدەک:** جۆرە قوماشێک بوو ڕەنگ دەکراو کەوای لێ دروستدەکرا.

**قەدەمخێر:** کەسێکە پێ و قەدەمی خێربێ.

**قەدەم شەڕ:** کەسێکە پێ و قەدەمی شووم و نەگریس بێ.

**قەدبەن:** قەدبەند.

**قەدبەند** (فە.): پشتێند، پژوێن، پشت بەن، کەمەربەن.

**قەدبڕ:** نزیک ترین ڕێگایە بۆ شوێنێکی کە چەندڕێگایەکی تریشی بۆ بچێت. ـــ ی: ڕێگای کورت گرتنەپێش.

**قەدبوون:** قوولزین، دەق بوون.

**قەدپاڵ** (فە.): بەرقەدی کێوی، لاپاڵ، (موک.) تیلەشان.

**قەدر:** ڕێز، ڕاژە، پەرای، پایە، ئەندازە، پلە، ژیان. ـــ گرتن: ڕێزگرتن، پایەپێدان، پلەپێدان. بە ـــ : بەرێز. بێ ـــ : بێ ڕێز.

**قەدکردن:** قولزاندن، چین کردن، (باک.) بەرقەکرن، سەرکۆنەکرن، جەرچکاندن، تەواندن.

**قەدرگرتن:** دەقگرتن.

**قەدقەد:** چین چین. ـــ کردن: پارچەپارچە بڕینەوەی دار.

**قەدوباڵا:** بەژن، قەدو قەوارە.

**قەدکەسێ** (ڕەوا.): ئەیڕۆ، (موک.) وەیڕۆ، (هەو.) وەشێرە.

**قەدکردن:** (ئەردە.) مووچاننەوە، نوشتاندنەوەی چت بەڕێکی، بڕینی دار.

**قەد وقەوارە:** بەژن، باڵا، تیر، ئەندازە.

**قەدێلە** (موک.): ملوانەی وولاخانە، گەرکوول، گەلاحە.

**قەدیان** (باک.): تەواوبوون، برانەوە، بڕان.

**قەدیشک:** گۆڕی پیاو چاکێکییە لەسەر زێی دەجلەیە لە هەرێمی حەسەنکێف گۆیا نزای بە خۆڕایی ناچێ

**قەدید** (هەر.): گۆشتێکە بەهۆی ساردی و سڕی ووشک دەکرێتەوە.

**قەدیفە:** قەیفە، جۆرە کاڵایەکە لووس و نرخدارە و ڕووشی تووکنە. جۆرە گوڵێکیشە، سووراو. ـــ یی: قەیفەیی، چتێکە ڕەنگی وەهی قەدیفەی بچێ.

**قەدیفک** (باد.): خاولێ.

**قەر:** تووزەکە لەناو نێوانی ڕەش و سوور دایە. نێوی پیاوێکی خایان بووە، گراو و سەوداسەری گوڵەزەردی ئامۆزای خۆی بووە، قەرو گوڵەزەرد کە بەندێکی بەناوبانگ و خۆشە باسی وان دەکات. (باک.) قەرد.

**قەراج:** قەرەقاج، ناوچەیێکە لەلیوای هەولێر.

**قەراچ** (باک.): چەقێن.

**قەراچۆ** (هەورا.): قڕان، قڕ. ـــ تێکەوتن: قڕان تێکەوتن.

**قەراخ:** قەراغ، (موک.) کەنار، پەڕ، (ڕەوا.) ڕۆخ، ڕوخ، (موک.) لێوار، سیلە، لەوچک، هیش، دەم، گووێ، (ئەردە.) قەوورخە، جەمک. ـــ چۆم: دەم ڕووبار، گووێ چۆم. ـــ دەریا: زریەپەڕ.

**قەراخگرتن:** کەناری سیخمەو کەواو چتی تر گرتن.

**قەرادە** (باک.): ووشک، بێ تین، بێ کەلک. ـــ کرن: ووشک کردن. (باک.) پیرێژن.

**قەڕازە:** زنجیرێکە گوێدرێژ و ئێستری پێ دەبەسترێتەوە.

**قەراسە** (باک.): ئاسنێکی درێژە بۆ بەرد هەڵقەندنی ئابیدە(مجسمە) بەکاردەبرێت. دەسکەوساری زنجیری ئێسترانە. (باک.) قەرازە، دارێکە بنی وی باریک و سەریشی ئەستوورە دەیخەنە بن بەرد و قورمی مەزن ڕادەکەن، سەرەباریکەکەی وە بن بەرد و چتی قورس دەدەن و سەرە ئەستوورەکەش دەگرن تا هێزی خۆی سەرەدارە ئەستوورەکە پتربێ.

**قەراستن** (باک.): بڵندکردنی بەرد و ئیتر بەهۆی قەراسەوە.

**قەڕراش** (باک.): ئاشەوان، ئاشڤان.

**قەراغ:** قەراخ. ـــ گرتن: گرتنی چتێک بە لێواری چتێکی تردا بە تەقەڵ.

**قەرەڵ** (زا.): لووتەوانەی ژنان.

**قەراڵ:** شاهەنشا، میری میران، ئیمپەڕاتۆر.

**قەراڵستان:** خاکی میری میران.

**قەراڵیچە:** شاژن، ژنی قەڕال.

**قەرام** (باد.): پارچە چەرمێکە دەخرێتە سەردەمی گۆزە و ئامانی تر تا چتی تێ نەکەوێ.

**قەڕان:** پارەیەکە ٢٠ شایی یە، (دراو.) قڕان، هەزار دیناری ئێرانییە لە مسقاڵێک زێوە. شوێنێکی پانی تەختە کە چەند سووارێک غار (تاو) ی تێدا بدەن بۆ تاقی کردنەوەی خێرایی وولاخەکان.

**قەرانکەکردن** (خۆ.): چەمانەوە.

**قەرو** (ئەردە.): شەوخم، ئاوونگ.

**قەرە** (رەوا.): رەشۆکی، بێ سەروبەر چاندن، زەوییێکی بکێڵرێ و ئاو بدرێ تۆی برنجی پێوەرکرێ و وولاخی لەناوکرێ و بیشێلێ تا تۆوەکەی تێکەڵ بە خۆڵێ بکات بەکردەوەی وا قەرە دەڵێن چونکوو ئەگەر گۆڵ گۆڵ بچێنرێ پوختترە. (موک.) وەرزێڕێکە جووتی نەبێ. نیشان، نیشانە، دیارکرد. (کە.) کەس: ــ م نەدی: کەسم نەدی. (کە.) هەرێم، لا، کن، نک، توخوون. دارەت: خۆی لەو دارەتە نادا: خۆی لەو قەرەیە نادا. گۆبەند و بروبیانوو: ئەم چتەی بۆ ــ داناوە: واتە بیکاتە گۆبەند و بیانوو. (موک.) کاڵەک لەقەرەگرتن: گوڵی کاڵەکی هەربە گوڵی پێش گۆیکە کردنی ئەگەر مێش لێی نەدابێ گەڵای خۆی لەسەر دادەنرێ و بە گڵ دادەپۆشرێ تا کرم لێی نەدا.

**قەرەباڵغ**: جەنجاڵ.

**قەرەبەشە**: جوورە مراوییێکە.

**قەرەبرووت**: چتێکە ئەوەندە سووتابێ رەش هەڵگەرابێ.

**قەرەبوو**: چتێکە بدرێ لە تۆڵەی چتێکی تردا، تۆڵە، لەبری، پاداش، سزا، چێرە.

**قەرەبووکردنەوە**: دانی چتێک بەکەسێک لە تۆڵەی چتێکی دا، تۆڵە بۆ کردنەوە.

**قەرەبوون**: دەم چەشت بوون.

**قەرەبینا**: پشتاو، دەوانچە، جوورە دەمانچەیێک بووە لە دەمییەوە دادەگیرا.

**قەرەپلاو**: (هەورا.) یەکاوەسیاوە.

**قەرەپووڵ**: پووڵی وورده، کەم نرخ و لەمس دروستکراو، سەتی ری ڤرانێکە ڤرانیک ۲۰ شاییەکە دەکاتە ۱۰۰۰ دیناری ئێرانی، فلس.

**قەرەتوون** (باک.): قارەڵتوون.

**قەرەج**: قەرەچ.

**قەرەجە** (هەو.): جوورە گوڵەگەنمێکە دەنکەکەی خڕ و رەق و رەش دەبێ.

**قەرەچ**: تیرەیەکی تورکی کۆچەرین، بێژنگ و سەرەند و هێڵەگی دروستدەکەن کە لێشیان هەڵکەوێ لە دزی و حیزی کۆتایی ناکەن، قەرەج.

**قەرەچەناخ**: چەنەدرێژ، دەمەدراو، زۆربڵێ، زۆر وەڕ، دەمەهەراش، چەنەلێدەر، قەرەچناخ، بەدوێژ.

**قەرەچناخ**: چەنباز، بێ شەرم، رووهەڵماڵراو.

**قەرەچۆڵ**: رەگەز و بنەچەی هۆزێک یا کەسێک، ــ یان نەما: واتە رەگەزیان نەما، تاق.

**قەرەچی**: قەرەچ، قەرێچ، کاولی، بێژفرۆش.

**قەرەخەرمان**: گوڵەپرووزە، گەنمێکە گوڵەکەی هەر بە سەوزی هەڵپرووزێنرابێ، گەنمێکە شیرەی بەتەواوی رەق نەبووبێ دەدروێتەوە بە لاسکەوە ئاگری پێوەدەنرێ نیوەبرژ دەبێ دوایە وەکو بروێش پاک دەکرێ و دەهاڕرێت بۆ چێشت.

**قەرەداشی**: جوورە هەڵپەڕینێکە.

**قەرەزاخ**: گرینۆک، هەرزەبێژ، قەرەقاژر، هەرزە، چناگەشکیاگ، هەرزەوێژ.

**قەرەزادغ**: چیایەکی کوردستانییە لە رۆژاوای ماردینییە.

**قەرەسەوە**: جوورە گومگومەیێکی مسینی مل درێژە ئاوی تێدەکرێ.

**قەرەسۆران**: چەتە، دزگیر، ڕادار.

**قەرەسی** (باک.): گێلاس و ئالووباڵووی کێوی.

**قەرەفە** (مەنگ.): زودەردە، تەلەزگە، بقە، لە ــ : بقەیە.

**قەرەقاچ**: دارێکی گچکەیە، کرمی کەژ هەر بەوەوە قوزاخەی دەکات و لە شووڵ (تووڵ)ەکانی سەوەتەو بەرچنە قوڵینە و تووڵینە و قەفەزی لێ دروستدەکرێ کە لوویەکی هەیە وەکو پاقلە و ماشە سپی قوزاخەیێکی هەیە پێی دەڵێن (کەژ) پەروەردە دەکرێ لە ئاوریشمی سپی تر و نەرم و جوانترە لە ریس و رستندا.

**قەرەقاژە** (ئەردە.): گریان.

**قەرەقاژ** (ئەردە.): گرینۆک، قەرەزاخ، هەرزە، چەناگەشکیاگ، هەرزەوێژ، قاژر، فرەگری.

**قەرەقاژر**: بڕوانە: قەرەقاژ.

**قەرەقەپ**: گەمەیەکی منداڵانە، (کۆ.) گەراقووپ، (هەورا.) قورووقەپ، گەمەیەکی بێ دەنگی و خامۆشییە، هەرکەسێ لەپێشدا باخوێ تێدەکەوێ.

**قەرەقەرە**: خۆشارکێ، چاوشارکێ، جوورە گەمەیەکە خۆیانی تێدا دەشارنەوە.

**قەرەقوش** (ئەردە.): دەردێکە لەبن دەست یا پێی ئەسپ پەیدا دەبێ، بالۆکەیەکی رەشی ووشکە لەدەست و پێی چارەوێدا پەیدا دەبێ.

**قەرەکەوتن**: توخوون کەوتن، نزیک بوون.

**قەرەکردن**: بەدی کردنی چتێکی دوور.

**قەرەلای لایی** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانەیە.

**قەرەڵوو**: قازمانە، قاسمانە، گاوبار، هەشتاوی، هەشتاڵوو.

**قەرەم**: نەیجوول. زەبەن، چڕ، بێشە، قامیشەلان.

**قەرەمچی** (باک.): رووی چرچ و مۆن و گرژ، وێکهاتوو.

**قەرەمینا**: قەرەبینا.

**قەرەنتوو**: تارمایی.

**قەرەنقولە**: چەرخێکی باریکە و پەرەدارە لەوێنەی مێخەکی پەرەدارە و کوندار میلی خولەک (دەقیقە) ژمێری کاتژمێر لە پارچەی سەعاتەکە دەخرێت.

**قەرەو** (بۆتا.، ژەن.، سوور.): سەهۆڵ.

**قەرەواش** (موک.): کارەکەر، کڵفەت، (باک.) قەرواسی.

**قەرەوانە**: قارەوانە، لەگەنێکی زۆر زلە، کە چەند کەس شێوی تێدا دەخۆن.

**قەرەووڵ**: کێشکچی، پێشدار، پەهقان، (کە.) قەلاویز. نیشان، نیشانە، سێرەی تفەنگێ. پێشڕەوی لەشکر، میر. گووێچکەی تفەنگییە لەسەر نووکی لوولەکەیەتی. ــ ی: پەهقانی.

**قەرەوونە**: کرمێکی گچکەی رەشە لەکەشکی ولەناو میوەی ووشکدا پەیدا دەبێ.

**قەرمووڵە:** چارپایە.

**قەرمووی:** کاڵەکی قەرەیی، (ئەردە.) قەرەبوو، جووری کاڵەکێکی گەورە و شیرین و خۆشە.

**قەرەهەواڵ** (کە.): زۆر پرسیارکار.

**قەرەیی** (هەورا.): جوورەکاڵەکێکی سەوزو زوورو گۆشتن و خۆشە.

**قەربوونەوە:** بەرو وورگی خڕو پڕ.

**قەربیل** (کۆ.): (بابا.)گڵگیر، (موک.)کەو، کونی لەشێلگیر و هەموو چتێکی تر گەورەترە.

**قەرپ** (باک.): قرچە شکان: شکاندنی دارانە.

**قەرپال** (زا.): بەرگی زۆر پیناوی، پەڕۆکۆن.

**قەرپ قەرپ** (باک.): دەنگی قرچەقرچی شکانییە.

**قەرپاچ** (بابا.): قامچی، (باک.)کەرپاچ.

**قەرپۆز:** قەرپووز، کاسە.

**قەرپک** (باد.): (باک.)قەفتک، گەرووی کراس و چتی ترە.

**قەرپۆس:** قەرپووز.

**قەرپووز:** قەلپووزی زین، کەلبووز.

**قەرپوونە:** کاسەی لامپا.

**قەرپووس:** قەڵپووز.

**قەرپینە** (باک.): قەرەبینا، شەش ئاگر، جوورە دەمانچەیێکە.

**قەرت** (کە.): سەر، پیر. ـــ بوون(باک.): سەربوون، پیربوون.

**قەرتاڵە:** سەوەتە، سەوە، (هەورا.) قەرتەڵە، قرتاڵە، (خۆ.، باڵە.) بەرچنە، تووڵینە، مەلکەب، (باد.)بەروارک. ـــ پووش: زلینە.

**قەرتاڵەی چکۆڵە:** کالک، کەلک، چنە.

**قەرتەل** (باک.): خەرتەل (باڵندەیەکە).

**قەرتەڵە** (هەورا.): قەرتاڵە.

**قەرتەمێر** (باک.): مرۆڤێکە لەنێوانی جحێڵی و پیری دایە، بە هی ٦٠ ساڵیش دەڵێن.

**قەرتلاندن** (باک.): لکە بێکەڵکەکانی داران هەڵپەرداوتن.

**قەرتلین:** هەڵپەرداوترانی لکە بێکەلکەکانی داران، بڕان.

**قەرتماخە:** قرتماغە.

**قەرتماغە:** قرتماغە.

**قەرتیش:** تویژەمار، پێست و پوولەکە ماسی.*

**قەرد:** قەرز.

**قەردار:** قەرزدار.

**قەردین**

**قەردین** (باک.): قەرزکردن.

**قەرز:** قەر، (باک.) کەر، (هەو.، کە.) قەرد، دراو و هەندێ چتی تر کە بۆ ماوەیەک بدرێ بە یەکێک.

**قەرزار:** قەرزدار، بدێکا.

**قەرزدار:** لەسەر، قەرزار، قەردار، (باک.) کەردار. ـــ ی: قەرزداری.

**قەرزدان:** قەرددان، کەردان، پارە یا چتێک بە قەرزدان بە یەکێک.

**قەرزدانەوە:** قەرددانەوە، دانەوەی قەرز بە خاوەندی.

**قەرزکردن:** قەردکردن، قەردین، کەرکرن، سەندنی پارە یا چتێک لە کەسێکی بەقەرز.

**قەرزکوێر:** سەرگێڕ، لامنجی، کەسێکە قەرزان درەنگ بداتەوە بە خاوەنی.

**قەرزکوێری:** سەرگێڕی، لامنجێتی، قەرز بەگران و ئاستەم دانەوە بە خاوەندی.

**قەرزو قۆڵە:** قەرزێکی زۆرە کە بتبێ بە سەر ئەم وئەوەوە، وام و وارە.

**قەرژنگ** (ل.): قرژاڵ.

**قەرس:** شاری قارسێ کە شارێکی کوردانە لەسنووری سۆڤیەتستانێ دایە.

**قەرسان:** بڕیارلەسەردران.

**قەرساندن:** قرساندن، تەخمین، بڕیارلەسەردان. بەستنی ئاو و هەموو چتێک لەسەرمان، مەیین.

**قەرسەقول** (هەورا.): تەرسەقول، تەرس، پیسایی چارەوێ. ـــ تلەوکەرە: گووخلێنە.

**قەرسەل:** قەرسیل.

**قەرسیل:** (باک.) قەرسەل، (هەورا.) کۆڵەبەس، (دزە.، موک.) دەغڵێکە لەنزیک ئاوایی نادروێتەوە بۆ لەوەڕی ماڵاتان دەهێڵرێتەوە بەشینی ووشکی. دەغڵی شینەکە ووشک بووتەوارەی پێدەڵێن. بە دەغڵی شینیش دەڵێن پێش گوڵ کردنی.

**قەرسین:** بەستن، مەیین، بەستران لەسەرمان.

**قەرشات** (باک.): سەکۆ.

**قەرف** (باک.): فشە، گەمە، شۆخی.

**قەرفین** (زا.): شکانی دار لە خۆیەوە.

**قەرقارک** (باک.): قورقوڕۆچکە.

**قەرقاش** (باد.): مەڕی سپی چاورەش.

**قەرقاووڵ** (ئەردە.): مریشکی کێوی، چوڕە.

**قەرقەر** (باک.): خەڵات، کفن، قەرقەل.

**قەرقەس** (موک.): کلۆشی دەرەوەی خەرمانێیە بە گوڵەوە دەخرێتەوە ژێر پێی وولاخەکانی گێرە.

**قەرقەش:** قەرقەشە.

**قەرقەشە** (ئەردە.): گێچەڵ، تەشقەڵە، شڵتاخ، دەبە، حولەسێ.

**قەرقەف** (هەورا.): جوورە دارێکە. (کە.) گرێ. (باک.) مەی، ئارەق، بادە.

**قەرقەل** (باک.): خەڵات، کفن.

**قەرقەمێ** (هەورا.): مەشکە کۆنێکە کە میوەی ووشکی تێکرابێ.

**قەرقوو:** زەبەن، قەرەم، گیا و پووشی زەبەن و قامیشەڵان و چرو بێشە.

**قەرقیت** (باک.): تێکوڵی هەرمی و گندۆرەیە کە ووشکی دەکەنەوە.

**قەرماندن** (باک.): ماندووکردن.

**قەرمچاندن** (باک.): ووردکردن، هارِین. چین چین و لۆچدارکردن.

**قەرمچین** (باک.): ووردبوون.

**قەرملاندن** (باک.): ماندووکردن.

**قەرملین** (باک.): ماندووبوون.

**قەرمووت** (باک.): ناوی گوندێکییە لە قەزای هەساریّ.

**قەرمچین** (باد.): چرچ بوونی پێستی ئەندام یا کالاّ.

**قەرمین** (باک.): ماندووبوون، قەرسین، رەقبوونی لەش لەبەر ماندووبوونی ئەندام یا سەرما یا باداری.

**قەرن**: سەدە، سەدساڵ.

**قەرنان** (هەورا.): قارنان.

**قەرنەقەسی** (باک.): جوورە سووێندێکە، کە کەسێک ئۆگری بووبیّ.

**قەرقە** (باک.): نێوی پیاوانە.

**قەرواش** (باک.): کارەکەر، قەرەواش.

**قەرواقە** (لو.): بۆق.

**قەروگوڵەزەرد**: یەکێکە لەدوازدە بەندەگۆرانیە کۆنەکانی کوردی.

**قەریّ** (باک.): نێوی ئافرەتانە.

**قەرێچ** (باک.): قەرەچی.

**قەرێژ** (باک.): قرێژ، گەمارە، قەلێرە.

**قەرییس** (باک.): گیایەکە.

**قەریسەک** (باک.): خووس، زوقم.

**قەز** (باک.): جوورە ئاوریشمێکە.

**قەزاتە**: رۆژنامە.

**قەزانمە**: جوورە گۆشتاوێکە پیازو لەپەی تیّ ناکریّ.

**قەزاز**: کەسێکە، کە قەراخی چەفتە و شەدە هەڵبەستیّ بە سوورمە. جوورە مەقامێکە. ـــ ی: قەزازی کردن.

**قەزازی کردن**: قەراخی چەفتە و شەدە بەسوورمە هەڵبەستن.

**قەزاوەگێر**: چتێکە وەی بگێرِێتەوە لە یەکێک یا چەند کەس یا جێگایەکی.

**قەزەب** (باد.): جەرگ، جیگەر.

**قەزخووان** (ئەردە.): قەزوان.

**قەزقان**: قەزوان.

**قەزقەوان**: قەزوان، قەسکەوان.

**قەزقووان**: قەزوان.

**قەزکووان**: قەزوان.

**قەزمەنوشتە** (کە.): نشتوو.

**قەزوان**: کەزوان، کزوان، (باد.) کەزان، (هەورا.) وەنی، قەنی، (کۆ.) قەسقان، کەسکان، قەسکووان، (دەر.) قەسقووان، قەزقەوان، بنیشت لە بەری دارقەزوان دەگیرێت. ـــ وورد: بنەوشۆکە، (هەورا.) مشک.

**قەزوانە فەریکە**: فەریکەقەزوان، قەزوانێکە تەرو ووشک نەبوو لە نێو دۆ و ترشیاتی دەکریّ بۆ خۆشی.

**قەزوان سم**: درێشەیێکی تایبەتییە قەزوانی پیّ دەسمریّ بۆ تەسبیح.

**قەزوان کرۆشکە** (کۆ.): باڵندەیەکە لە بەفرخۆرکەی دەچیّ بەڵاّن گەورەترە.

**قەزوانی** (هەورا.): شین بۆرە.

**قەزەکردگ** (ئەردە.): ترشیاگ، چتی ترشاو وەکو دۆو ماست و چتی تر.

**قەزیەڵە** (فە.): ژاڵە، لوورک.

**قەساب**: ئاژاڵ و ماڵاّت سەربِر. ـــ خانە: شووێنێکە کوژتاری ماڵاّت و ئاژاڵانی لیّ دەکرێت. ـــ ی: پیشەی قەسابە.

**قەسابی کردن**: سەربِرینی ئاژاڵان و ماڵاّتان و شەق وپەق کردنی ئێسک و گۆشتەکەی بۆ فرۆشتنی.

**قەساو**: قەساب. ـــ خانە: قەسابخانە. ـــ ی: قەسابی، ساتۆر، قەمە.

**قەسەتۆرە**: تیغێکە وەک شیر بەڵاّم ئەم کورتترە و دەمەکەشی پانترە.

**قەسەر**: قەسەڵ، سرووت، گەنم و جۆی بەساق پووشەکەی دوورراوەوەیە وورد نەکراوە.

**قەسەڵ** (هەو.): قەسەر، سرووت، (موک.، سۆرا.) کلۆش، کولۆش، پەرێز، کای درشت، دووای درِوێنە لە مەزرایە ئەوەی کە دەمێنێتەوە و بە پێوە راوەستاوە ـــ ی پێدەڵێن. ـــ ی: وولاّخێکە ئارەقەی کردبیّ کە کورتان یا زینی لێکرێتەوە و سەرمای بیّ تووشی نەخۆشیەکی دەبیّ پێی دەڵێن قەسەڵی. جوورە تفەنگێکیشە.

**قەسپ**: چەشنی خراو و گەندترین خورمایە کە کوردکوژی پێدەڵێن. (سوور.) شەقلە، ئەو دارەباریکانەیە کە بەسەر ئالوودارانەوە رایەڵ دەکرێت.

**قەسپەتوو**: جوورە توویەکی دەنک گەورەی سپی و شیرینە.

**قەسپەگڵ** (کۆ.، دزە.): قەسپۆک، گڵێکە کلۆکلۆ و لووسبیّ و گژوگیای لیّ شین بیّ.

**قەسپۆک** (هەو.): (کۆ.) قەسپەگر، زەوییەکی سوورکەڵەیە کە هێندە رەقبیّ گاسن کاری لیّ نەکات.

**قەستەقول**: تەرسەقول.

**قەستەم** (کە.): پەشتەماڵی رەنگینی ئاوریشمی کوردستانییە.

**قەستۆر**: پارچە کالاّیەکی ئەستوور و توونکە.

**قەستی**: بەقەستی، دەسکۆرِ، گوفتار یا کردارێکە بە تایبەتی بکریّ: تۆ بە قەستی ئەو قسەیەت کرد.

**قەسخووان**: قەزوان، وان، (ئەردە.) وەنەتەق.

**قەسرا** (باک.): نێوی دوو گوندانە یەک لە سنووری دارانسیبینی و یەکیش لەسنووری داراوماردین دایە. وادیارە کە ئەو هەردووک گوندانە لەسنووری دەرەبەگی شاری داریّ بوون هەرگوندەی قەسرێکی گەورە و بڵندی تێدا هەیە هی لای رۆژهەڵاّتی قەسری بووبلانە هی رۆژاوایش قەسری قەڵەندەرییە.

**قەسران** (هەو.): سرِبوون لەسەرمان، کەسیرەبوون لەسەرمان.

**قەسراندن**: سرکردن لەسەرمان.

**قەسریک** (باد.): تەنەکەیەکە لە لانکی دەخریّ تا منداڵی ساوا میزی تیّ کات.

**قەسرین** (هەو.): گوێرەپەی وولآخان، نەخۆشییەکە لـە سـەرمان تووشی وولآخان دێت، سڕبوون لـە سەرمان.

**قەسان** (باد.): قوسسان.

**قەسفاندن** (باد.): پارچەپارچەکردنی گۆشت بۆ فرۆشتنی.

**قەسفین** (باد.): قەسرین لـە سەرمان.

**قەسقان** (کۆ.): قەزوان.

**قەسقەوان:** قەزووان.

**قەسقووان** (دەر.): قەزوان.

**قەسکان:** قەزوان.

**قەسکووان:** قەزوان.

**قەسناغ** (هـەو.): کێشـێکی دەغڵییـە، دووکوڵـە، پـڕ بـە دوو تەنەکـەی نەفتییە، قاسناخ، قەسناغ.

**قەسناغ:** قەسناخ.

**قەسناغە:** قاسناخ،قەسناخ.

**قەسنی:** چتێکە وەک بەرەمێو بۆنی زۆر خۆشە.

**قەسووان:** قەزوان.

**قەسیان** (ئەردە.): هەژاری لات. ڕشانەوە.

**قەسیسە:** (کۆ.) غەڵـە، کەڵـەک، دیوارێکـە لـە قـەراخ باخچان بەووشکە بەردان هەڵدەچنرێت.

**قەسیل:** قەرسیل، دەغل و دانێکی شینە تازە قەفی کردبێ سا گەنم بێ یا جۆ.

**قەسیلە:** کەوچک.

**قەش** (خـۆ.): وولآخێکە چواربێ و نێوچاوانی سپی بێ، بەش. شووم، نەگبەت، قەشان.

**قەشا** (باک.): سەهۆڵ.

**قەشارتن** (باک.): شووتی یا کاڵەک قاشکردن.

**قەشـان:** مـارۆ، بـەش، نێوچاوان سپی بۆ ئـاژاڵ و مالآتـان لـە هـەندێک شوێنان تەنها بۆ بزنانە. قەش، شووم، نەگبەت، بەدبەخت.

**قەشاو:** قاشاو.

**قەشاووش:** قاشاو.

**قەشە:** کەشە، کەشیش، پێشەوا، زانای ئایینی فەلەو دیانانە.

**قەشەم** (باک.): پارچەی بەفر یا سەهۆڵە، سەهۆڵ.

**قەشەنگ** (هەورا.، ئـەردە.): جـووان، شۆخ، شیرین، زێـوا، (ئـەردە.) کەیلان. (هەورا.) ـــ ی: جووانی، شۆخی، شیرینی، زیوانی، کەیلانی.

**قەشەیەتی:** کەشەتی.

**قەشتین:** ڕۆیشتنی یەکێک کە حەز لـە مانەوەی نەکرێ.

**قەشفووس** (باک.): برین.

**قەشقە** (کۆ.): نەگبەت، بەدخوو، شووم، قەشکە. (بابا.) قومارباز، کـەر یا ئێسترێکی نێوچاوان سپی و بزۆزە. گیایەکی چڵ چڵەو بڵندە بەقـەد گەنمی بەرز دەبێ و گوڵی سپیە مالآت دەیخوا. کوڵۆڵی بەدبەخت.

**قەشکە:** بزۆز، قەسقە، مرۆی نێوچاوان سپییە.

**قەشـمـەر:** قەشـمـەرجاڕ، گەمـەچی، گاڵتـەچی، بـەزمچی، تیزجـاڕ، کۆسەوەوی، کۆستەبووکە، لیێپۆک، لیقۆک.

**قەشمەڕ:** بەچکەی مەیموون. ـــ جاڕ: کەسێکە شایانی قەشمەری پێکردن بێ، لیپۆک، لیقۆک. ـــ ی: گاڵتە، گەمـە، قومار، یاری کردن، تەڕانە، تەوزە، تیتالی، لاسایی کردن، (خۆ.) تیز، سوویار، مەزاق.

**قەشمەری جاڕ:** جێگایەکە گەمـەو قەشمەری زۆر لێ بکرێت، زڕخانـە، تیزەجاڕ، تیزەزارۆک، ئاواوۆک.

**قەف:** ـــ ی قامیشی: چتێک، ماسوور، قەڵ، نێوانی دووگەی قامیشـی و حەیزەران و گیایانی تردا. ـــ ی گۆچان و ئیتر: شووێنە چەماوەوەکەی. ـــ ی سمێڵ: سەری سمێڵـە کە قـەف دەخووات. ـــ مـەردم: قـاپی مـەردوم. (باک.) پەنا، پەسیو، بەندەر. (ئەردە.) کەوورک.

**قەفانچەرە:** ماشەی تووڵێنی ماشەگرتن. باڵینەیەکی تووڵێنە لـە ژێر چتی تۆقزی دادەنێن بۆ ڕاوەستانی.

**قەفانچەلە:** قەفانچەرە.

**قەفاندن** (باک.): پەنادان. بقەفینە: پەنابدە.

**قەفەز:** بێرکم، توولـە، ڕکە، ڕکـەم، (قەفـەس)، چتێکـی پەنجـەرەدارە لەدار یا لەئاسن دروستدەکرێ بۆ تێخستنی هەندێ باڵدار.

**قەفـەزە:** ـــ ی سینگی: چۆلایـی ناوسـینگە بـە پەراسـووەکانەوە کـە دەورەیانداوە، ڕکـەل. جـوورە دۆلآبێکـە پـەرتووک و هـەندێ چـتی تـری تێدەخرێ. قەفەزێکی گەورەیە لەسـەر هێندێ گۆڕ دادەنرێ بۆ پارێزگاری گۆڕەکە.

**قەفەس:** قەفەز.

**قەفەنگێو:** چەند شیشەتووتنێکە، کە لەسەر یەک دانرابێ بۆگەیین و ڕزی بێ.

**قـەفت** (بـاد.): جومگـەی دەسـتی. (بـاد.) قـول، دەسـک. ـــ ەک گـوڵ یاگەنم: دەسکێک گوڵ و قولێک گەنم.

**قەفش** (زا.): لەوەڕی کەم.

**قەفقەف:** قـەفی یـەک لـەدووای یـەکتری، قەفقەفی، گرێ گـرێ، ئاڵقـە. پرچی ـــ: بەگوریزە، کرووز، گونگڵ. ـــ ی: قەفقەف، گرێ گرێ.

**قەفل** (باک.): باقە، (باک.) گورز، مەڵۆ.

**قەفلاندن** (باک.): سڕو بێ هەست کردن لـە سەرمان. بقەفلێنە: سڕکە.

**قەفلەک** (باد.): ملوانکەی مـەرجان و کارەبا.

**قەفلین:** تەزین، بێ هەست بوون لـە سەرمان.

**قـەف و گـوڵ:** کاتێکـە، کـە دەغڵ بـە تـەواوی قـەفی کردبـێ و تاکتاکـە گوڵیشی کردبێ.

**قەفی قامیشی:** (باک.) چیتک.

**قەفەز** (باک.): تووێژ، پیستی تەنک.

**قەفد** (باک.): مستێک. دەستە، بەستە، مشتێو دەسکی خەنجەرییە.

**قەقە:** ققە بەزاراوەی منداڵی ساوا تا ساڵێکی بە شەکرۆکەو چتی شیرین دەڵێن.

**قەقەقەک** (فە.): قرتەقرتی مریشکانە.

**قەقفە** (کۆ.): گیایەکە بۆ کەچەڵان دەستدەدا. گیایەکە قەفقەف لەنێو یەکتری دایە.

**قەقنەس** (کە.): گۆیا مەلێکە دەسووتێ و لە خۆڵەمێشەکەی هەزارانی وەک خۆی لێ دەکەوێتەوە، هێندێکیش لایان وایە کە دەنگی هەند خۆشە بە سۆزی خۆی دەسووتێ. بە هەموو چتێکی سووتاویش دەڵێن.

**قەل**: قەلەموونە، عەلەشیش. قاژوو. بزن و مەرێکە، کە تاقە گوێیەکی برابێ. یەکێکە چاوێکی پووچ و کوێربێ. (هەورا.) قالاو، (دەر.) قەلا، قەلەرەشە. بە هەموو جوورە مەلێکی رەشی وەکو قاژوو و نیتریش دەڵێن. (ئەردە.) مرۆی زماندرێژ، زوواندار. سەرشار لە گەمەی قەلەمەنداریدا.

**قەڵا** (دەر.): قەل. دژ، قەڵات، سەنگەر، خانوێکی قایمە بە شوێنێکی بەرزەوە، شوێنێ یاخی و سەخت. (فە.) قەلەرەشە. قەڵایی.

**قەڵابێکچی**: کەسێکە قاپ و مسی بە قەڵایی سپی بکاتەوە.

**قەڵابەند**: سەنگەربەند. ـــ ێ: سەنگەربەندی.

**قەڵاپارێز**: سەنگەرپارێز. ـــ ی: سەنگەرپارێزی.

**قەڵاپەچن**: بەرزەکوڵ، (رەوا.) قەلاپەستە. ـــ کردن: هەڵچنین، لەسەر یەکدانان. پڕکردنی قاپ یا هەر جوورە دەفرێک بێ بە جوورێک لەدەغڵ و دان و چتی تر کە بە قیتی لەسەری وا راوەستێ کە برژێ.

**قەڵاپەستە**: چەند کەسێک یا چەند چتێک بەسەر چتێکدا بکەون. (رەوا.) تێک پەستراو، قەلاپەچن.

**قەڵات**: کەلات، قەڵا، دژ، برج، بورج، قەڵای بەرز.

**قەڵاتە**: قەڵادەی ملی تاجیان بۆرپستکردنیان. (هەورا.) قەڵاخ

**قەڵاتێ** (هەورا.): قەڵات.

**قەڵاتی شۆشێ**: یەکێکە لە قەڵاتەکانی میری رەواندزێ کەوتۆتە باشووری رۆژهەڵاتی رەواندزێ.

**قەڵاتی لۆکان**: یەکێکە لە بورجەکانی میری گەورەی رەواندز لە باکووری رۆژهەلاتی رەواندزێ دایە.

**قەڵاچ**: پێوانەیێکە بە کرانەوەی هەردووک باسکان، باڵ، گوریسی مە ٦ باڵەیە ٦ قەلاچە.

**قەڵاجە** (کە.): مەلێکی رەشی بەقەد کۆترێکییە.

**قەڵاچ** (باک.): زوورک، چەقێن، زەوی پڕ ووردەبەرد.

**قەڵاچن**: قەڵاپەچن.

**قەڵاچۆ**: بروانە قران، قرانی گیاندار.

**قەڵاخ**: دەمەو تەپاڵان، (هەورا.) قەڵاتە، قلاخی تەپاڵان، کۆگای تەپاڵان. (باک.) ئێتوون هی دیزەو گۆزان سوورکردنەوە. ـــ ی (ئەردە.): چتی زۆر رەشی خومی، کە بۆ پرسە دەپۆشرێ، قالاخی.

**قەڵادە**: خەلتەیەکە لە ملی سەگ و تاژیان دەکرێ، ملوانەی تاجی و سەگان، سەنجۆل، سەنجوو، ستۆبەند، قەلێتە، قلێتە.

**قەڵادزێ**: شارۆچکەیەکی کوردستانی عیراقە.

**قەڵادۆشان** (ئەردە.): قەڵاندۆشکان، بانشان، سەرشان.

**قەڵاس**: قەڵداس، گیایەکی بەهارییە وەکوو کەرخنکێنەی وایە.

**قەلالاس**: پرژ (پژانگ) گوڵی گەنم و جۆو برنج.

**قەڵاش** (هەو.): رووت، نابووت، بێ پارەو پوول. (باک.) بداخووازا گەرناس و لاش چرین هاتیە.

**قەڵاش**: قڵیش.

**قەللاش** (ئەردە.): بێ ئابروو، داوباز، (ئەردە.) لەوەن.

**قەڵاشبوون**: نابووت بوون.

**قەڵاشتن**: یەکالەکردن، قەڵەشتن، کەڵاشتن، دووپارچەکردن، (باک.) بەلقتاندن، قەڵەشاندن، قلاشتن، قڵیشاندنەوەی چت.

**قەڵاشتنەوە**: قەڵەشتنەوە.

**قەڵاشدن**: قەڵاشتن.

**قەڵاشران**: (باک.) بەلقتین.

**قەڵاشکەری**: داری قەلاشکەری، زەنگەتەلیشە، زەنگەقڵیشە.

**قەڵاشکێن**: تۆپێکی بەهێزە قوللەو قەڵایان دەرووخێنێ، بۆ مرۆی بەهێزیش بەکاردەبرێ.

**قەڵاغ**: کۆمایە لەسەر یەکتر هەڵچنراوە لە دەوە و تەپەلە وەکو گیشەی گیای.

**قەوارە**: قەبارە، قورم، (باک.) بەشەن، پەیکەر، دیمەن، تۆویزم، رووالەت، قەدوباڵا، شێوە.

**قەڵافس**: هەر گوڵێکی شێست پەر نەبێ ـــ ی پێدەڵێن.

**قەڵافۆپێشا** (هەورا.): قەڵافەتی ئێسک.

**قەڵاقەڵا**: ووتەیەکە لە گەمەی چاوشارکێدا وەستا دەیڵێ. پلاوپێو، مالامال، لێوڕێژ.

**قەڵاقبازە** (فە.): قەلەبەڵەک.

**قەڵاقووچکە**: قووچکەیێکی بڵندە و قووچەکێکی بەرزە وەکوو قەڵاییێکی قووچ و قیتە.

**قەڵاقینک** (هەورا.): باسکلاو، کلاوبنە، جوورە رێواسێکە.

**قەڵاکە**: قەڵانک.

**قەڵاکردن**: پڕکردنی چتێک لەچتێک بە جۆرێک کە بەرزبێتەوە.

**قەڵان** (باد.): هەڵکەندنی گیا، وێرانکردن.

**قەڵانچە**: قەڵەباچکە.

**قەڵاندن** (باک.): وێرانکردن، کوڵاندن. قەڵان.

**قەڵاندۆش**: (هەو.) قەڵانقووچ، (کۆ.) قیلەقاچ، قەڵاندۆشکان.

**قەڵاندۆشکان**: قەڵاندۆش، هەردوو سەرشانی مرۆ کە مناڵێکی بخرێتە سەر و هەردووک لاقی بەملاو بەولای ملیدا شۆڕ بوو بێتەوە.

**قەڵانقووچ** (هەو.): قەڵاندۆش.

**قەڵانکردن**: دابوون، سەر بەناودابردن لە گەمەی (سنکەوباز) و (یەکەو حەیزەران) دا.

**قەڵانگ** (کۆ.، جا.): دارێکی سەر دووفلیقانەی درێژە بەری دارانی لە لکە بڵندەکان پێ لێ دەکرێتەوە، چەڵاکێکی سەرچەماوەوەیە مازوو و بەری دارانی لە لکە بڵندەکان پێ لێ دەکرێتەوە. (موک.) چەلاک. (موک.) قولفەیەکی زمانەدارە چتی پێوە هەڵدەواسرێ، شالۆک، (جا.) گالۆکە، (هەورا.) قالنگە. (هەو.) وەکو داسی وایە، بەلان تیژ نیە و پانە

باقەی پێ هەڵدەگرنەوە. (کە.) قەلانگی بەن و دەزووی و بە گۆچانی سەر چەماوەوەش دەڵێن.

**قەلانگە** (جا.): چەلاک.

**قەلاوەسیاوە** (هەورا.): قەلەڕەشە.

**قەلاووز** (باک.): پیرێژنێکە لەنێوانی کوڕ وکچێکیدا بێت و بچێ و بە شێوەیێکی ڕەوا پێک ببڕێن.

**قەلاویز** (کە.): قەرەوڵ.

**قەلای** (لو.): قەلایی.

**قەلای بانکێف**: قەلاتی سەرکێو.

**قەلای دمدم**: لەسەر گردێکییە ڕێگای کاتژمێرێک لە ڕەوانـدز دوورە. شوێنەوارێکی مێژوویییە، لە وورمێ و خانی لەپ زێڕینی تێدا ژیاوە.

**قەلایی** (باڵەک): قا، چتێکە وەکو زێوی وایە لەحیمی پێدەکرێ و هیرباریشی پێ سپی دەکرێتەوە.

**قەلایلە** (هەو.): جوورە دومبەلانێکی ووردو ڕەشە.

**قەلە**: قوللە، تەپڵسەری کێوی، چیە، کلاوە، قەلەپۆپە، پۆپە.

**قەلەباچکە**: قشقەڵە، قەلەبازەڵە، قشقەرە، (کە.) پشت کەرخۆرە، پەلەوەرێکە لە کۆتر گەورەترە بازووکلک درێژە بە قونە دەڕوات گۆشتی ناخورێ.

**قەلەبازەڵە**: قشقەڵە، قەلەباچکە، قشقەرە.

**قەلەباشکە** (هەورا.) : قەلەباچکە.

**قەلەبانەیی** (شارە.): قەلەسابوونی، داڵەسپی.

**قەلەبەرخۆرە** (کۆ.): قەلەبەرخۆڵە.

**قەلەبەرخۆڵە**: باڵندەیێکە بەقەدەر قەلێکی ڕەنگی بۆر و زەرد و کەسک و شین دەنوێنێ، ترێ و هەنجیری دەخوا.

**قەلەبەڵەک**: قەلەسابوونی. قشقەڵە.

**قەلەپڕ**: ژەکێکە لەلوولە قامێشێک کرابێ بە ئاوور گەرم کرابێ تا بووبێ بە فرۆ.

**قەڵەپۆپە**: لووتکەی شاخ، سەرلکی درەخت.

**قەلەتە** (موک.): قەلادە، ملوانە.

**قەلەخ** (هەو.): برینگی ئاژاڵ بڕینەوەیە.

**قەڵەخ** (ئەردە.): پێست.

**قەلەخەرمان**: قەرەخەرمان.

**قەلەڕەشە**: قرک، قەلا، قالاو، قەل، ڕەشەداڵ، باڵندەیێکی گەورەی ڕەشی دەشتییە.

**قەلەزرو** (خۆ.): ترسەنۆک.

**قەلەزارە**: قەلەباچکە.

**قەلەسابوونی**: قەلەبەڵەک، قژاک، قژک، دەنگی ناخۆشە.

**قەلەش**: قڵیش.

**قەڵەشان**: قڵیشان، هەرەس بردن، قڵەشان، فەتسان، فەتسین، قەڵەشتبردن، داقەڵشان، تڵیشان، درزین.

**قەڵەشاندن**: قەڵەشتن، قڵەشاندن، داقەڵشاندن، هلپەکاندن، فەتساندن، تڵیشاندن، قلیشاندن، کەوتاندن.

**قەڵەشاو**: تڵیشاو، قلیشاو.

**قەلەشبردن**: قلیش بردن.

**قەڵەشت** (موک.): شەقیف، کەلەشتە، شەقار، قڵیش، زەندۆڵ، زەنک، درزی گەورەو بچووک، دەرەزی گەورەو بچووک، تەرەک، تریز، ترک، تیک، چەت. ـــ ی کێوی دۆژار.

**قەڵەشت قەڵەشت**: شەقارشەقار.

**قەڵەشتن**: ترکاندن، داقەڵەشتن، کەساخ، قەلاشتن، قەڵەشاندن، بەلقتاندن، (باک.) سەکتین، قڵیشاندن.

**قەڵەشتنەوە**: قەلاشتنەوە.

**قەڵەشتی**: قەڵەشتراو.

**قەڵەغان** (فە.): قالوو، تێسوو.

**قەلەفڕ**: قەلەپڕ.

**قەلەفسە**: جوورە گوڵێکی زەردو گەورەیە، بەلام مێیەو ٥، ٦ پەڕێکی هەیە.

**قەلەفیسک** (باک.): (باک) قەلەڤزگین. ـــ ا ڕوونیشتن: لەسەر ئەژنۆیان دانیشتن.

**قەلەڤزگین** (باک.): لەسەر چۆکان دانیشتن.

**قەلەقاژ** (کۆ.): قاژوو.

**قەلەڤزگین** (باک.): لەسەر چۆکان دانیشتن.

**قەڵەم**: پارچەدارێکی کورت و سەرتیژە، دەرخک. پێنووس، خامە، (باک.) کەلەم. پارچە پۆلایەکی لووت درێژە دەخرێتە ناولووتی قەڵەمگیر و بیرازی پێ دەکرێ. دروو، درک، زیی. لقێکی بێ ڕیشەیە لەچنار و گوڵە باخ و هێندێ درەختی تر کە وەک قەڵەم دادرێ و دەیچەقێنی و دەڕوێ، شەتڵ. ئەنداز، هەند، چەندێک، ئەمرۆ ـــ یێک کەل وپەلم کڕی واتە ئەندازەیێک. (هەو.) بلوێری لانکێ و تەنها لەگەڵ لانکێ بەکاردەبرێ: قەڵەمی لانکێ.

**قەلەمان**: قەڵەمدان.

**قەڵەمانێ**: جوورە گەمەیەکە بە قەڵەمدانی دەکرێ بەمجوورە لە هەر ڕوویەکی ژمارەیەک دەنووسرێ و وەکو مۆری تاوڵە هەڵدەدرێ ئنجا ژمارەی هەرکامێکیان زۆرتربێ ئەوەندە دارە یا گورز لەویتر دەدات.

**قەڵەمە** (ئەردە.): قۆلەمە، لوولاک، لوولاق، ساق، ساقۆڵ.

**قەڵەمباز**: باز، قەڵەمبازد. ـــ دان: هلجنقین: بازدانی بەگوڕ، تۆلەقاسک. ـــ پێدان: هلجنقاندن، ڤەچنقاندن.

**قەلەمبازدان**: فتلۆپاچک، فەرهاندن، ڤەجنقین، فرتدان، هلقەواستن، هلبەهین.

**قەڵەمبڕ**: پێنووسبڕ، خامەبڕ، قەڵەمتاش، جوورە چەقۆیەکی تیژە قەڵەمی پێدا دەدرێ.

**قەڵەمتاش**: قەڵەمبڕ.

**قەڵەمتەراش**: قەلەمتراش، قەڵەمبر.

**قەلەمتراش**: بڕوانە: قەڵەمتەراش.

**قەڵەمچی:** کەسێکە هەر کرو فرۆشیاری تووتن بێ.

**قەڵەمدادان:** دادانی قەڵەم بە جۆرێک کە پێی بنووسرێ.

**قەڵەمدان:** قەڵەمدانک، قوتوویەکی درێژکۆڵەیە دووپارچەیە ئەوی کە پێنووسی تێدەخرێ لەوی تر دەنرێت.

**قەڵەمراوی:** (موک.) مریشکاوی، بەقەد هەوێردەیەکیە لاقی درێژە و ڕەنگی بۆرە دندووکیشی درێژو زەردە لەئاوێدا مەلەی دەکات.

**قەڵەمڕەو:** قاد، وڵکە، وڵات، ناوچەیێکە، کە لە ژێر دەستەڵاتی کار بە دەستێکیدابێ.

**قەڵەمردار:** قەڵەمندار.

**قەڵەمرداری:** جۆرە یارییەکی دوودەستەیی یە بە تۆپ دەکرێ.

**قەڵەمزریش** (باک.): میداد، قەڵەم، خامە، پێنووس.

**قەڵەم سەنگتاشی:** قەڵەمی بەردتراشی.

**قەڵەمسڕ:** پێنووس پاکەرەوە.

**قەڵەمکردن:** تاشینی سەرو ژێری ڕیش بەرێکی، بڕین، پەیکردن.

**قەڵەمکردن:** پەیوەندکردنی درەختێک لە درەختێکی دی. بڕینی سەر لقی دارو درەخت.

**قەڵەمگیر:** چەکوچێکی لووت کلۆر، قەڵەمی بیرازی تێدەگیرێ.

**قەڵەمنار:** کوژتار، گیکوژی، هێدی و ئارام بوونەوە، دامرکانەوە.

**قەڵەمندار:** (کۆ.) قەڵەمردار، هۆڵ، (باد.) تەزە، لە گەمەی تۆپێنێدا.

قەڵەم ودەوات: پێنووس و مەرەکەبدان، قەڵەمدان.

**قەڵەموونە:** قەل، (موک.) بووقلە، (هەو.) حەلەشیش، (باد.) ئەلۆئەلۆ، بوقلەموون.

**قەڵەمی ئاسن:** نەسکەنە، قەڵەمێکە بەکاری هەڵکەندنی دارو ئاسنی دێت، ئاسنبڕ.

**قەڵەمی بێشکی:** بلوێری لانکێ.

**قەڵەمی دەست وپێیان:** مەبەس لەباسک و لوولاکە.

**قەڵەمی مۆرچینەتی:** چقی.

**قەڵەمی موو:** فرچە، فلچە، پرچە، پرچۆک.

**قەڵەمی نووکدار:** پۆزقەڵەم.

**قەڵەن** (باک.): جیازی بووکان. (باک.) پارەی مارەیی ئافرەتان.

**قەڵەندەرا:** ئێلێکی کوردە لە ڕۆژهەڵاتی ماردینێ دایە. قەسری قەڵەندەرا جێگای ئالی وان بووە.

**قەڵەندەر:** بێچارە، بێ نەوا، بێ کەس واژی تەر زل، بە وانەش دەڵێن کە دەربەستی خۆشی و خواردن و پۆشین و چتی وانەبن. ـــ ی: بێچارەیی، بێ نەوایی، دەربەست نەبوونی خۆشی جیهان بە بەرگ و خواردن و خواردنەوە و گەڕان و سەیران.

**قەڵەنۆر:** (دەر.) چەوبازە. (موک.، بار.) گنۆر، گیایەکە لاسکی پاک دەکرێ و دەخورێ نێرتکەکەشی بە پاکراوی دەخورێ، بنی قەڵەنۆری دوای ووشک کرانەوەی بە ووردی بەهەر شووێنێکی وەرکرێ کێچی لێ نامێنێ، گەڵایەکەشی لە باخەڵ نرێ کێچی تخوون ناکەوێ.

**قەڵەنگ:** قەڵاتە.

**قەڵەو** (موک.): (باد.) قەلەو، (فە.) سێروونی، گۆشتن، مەس، (باک.) گلوول، پاسۆتی، زل، زەلام. چەوور، تێر دزن، بەزدار، چاخ، تێر بەز، گۆشتن، دژی لەڕ.

**قەڵەوازی** (خۆ.): ئاوەژوو.

**قەڵەوز** (ئەردە.): قەڵبەزەی ئاو.

**قەڵەوبوون:** گۆشتی بوون، گۆشتگرتنی گیاندار.

**قەڵەوقووتە:** ڕووت وڕەجاڵ، بۆ خزم و جیرانی ڕەش وڕووت بەکاردەبرێ.

**قەڵەوی:** زهۆم، چەوری. گۆشتنی.

**قەڵب:** قەڵپ، چرووک، ناساخ، قەڵپ و قولاپ، ناڕەوا، بێ برەو، مەبەس لە پوولی ساختەو چرووکە. تەنبەڵ، دەخەڵ، ناڕاست. (کە.) جندە، سووزمانی. پارەیەکی ساختەیەو کەناچی.

**قەڵباز** (ئەردە.): قەڵەمباز.

**قەڵبە** (بابا.): پەل، دارێکە سەری پەل وکورت و تیژبێت. سەرە لووتێکی درێژو تیژە بەدارو دیوارو ئاسنەوە لە هەرچی بکەوێ برینداری دەکات. جێگەیەکە لە کاڵاو یا لە جەستە کە قەڵبە لێیدابێ.

**قەڵبەز:** ڕێزە بەردێکی زلە لە گرد یا لەشاخ کە ژێری هوڵۆڵ بێ.

**قەڵبەزە:** قەڵپەزە، تاڤگە، قۆنگەرەکردنی ئاو.

**قەڵبەزەن:** کەسێکە پوولی قەڵب و ساختە لێ بدات. ـــ ی: پیشەی پارەی قەڵب لێدانی.

**قەڵبەژەن:** قەڵبەزەن.

**قەڵبەن** (ئەردە.): پشتێند.

**قەڵبیر:** قەڵبیر.

**قەڵبیر:** چتێکی کونکونە. بێژنگ. دانەوێڵەی پێ دادەبێژرێ، برنجی لە ئاشیدا پێ پاک دەکەنەوە.

**قەڵبیرە:** قەڵبیر.

**قەڵبیر** (ئەردە.): قر، ناز، قەڵبیرە. ـــ چی: ئەو کەسەیە بە قەڵبیری برنجی پاک دەکاتەوە.

**قەڵپ:** قەڵب، چتی کەم نرخ وبێکارە. (ئەردە.) کڵۆکەی تۆپەڵە.

**قەڵپاخ:** قەپلاخ، قەڵتاخ.

**قەڵپە** (ئەردە.): قەڵب.

**قەڵپەزە:** قەڵبەزە، تاڤگە، کەڵبەز، کەڵوەز، پرژ، ئاوێکە لەجێگایەکی بڵندە وە برژێتە خوارەوە ویا لەناو ڕووبارانداا بەسەر بەردی بڵنددابباز بدات.

**قەڵپەزەن:** ساختەکار، کەسێکە، کە پوولی ناڕەوا لێ بدا.

**قەڵپەکوچک:** کڵۆپەرد.

**قەڵپک** (باد.): تێکرڵی گووێز و ماش و نیسک و نۆک و ئیدیکەیە.

**قەڵپووت:** کووزێکە گلێنەی نەمابێ. گووێزێکە هەر بەدارەکەیەوە ناوەکەی خورابێ.

**قەڵپووز:** قیتایەکەی لای پێشەوەی سەرزینییە، گووزگریک.

**قەڵپووس:** قەڵپوور.

**قەڵپ و قولاپ** (شا.): ناڕاست، خووار، دەغەڵ، چتی خراو، خێچ.

**قەڵت:** قەد. ـ کردن: قەدکردن، بە تەورەداس و تەور و چتی تر داربڕین و هەڵپەرداوتن.

**قەڵت** (دزە.): ئەو تاق و لۆقەیە کە دووای گێرەکردنی دەغڵ دەمێنێتەوە و لە کۆزەرەی گەورەترە.

**قەڵتاخ** (باک.): تەرم، جنازە، قاڵتاخ. پیرێژن. (باک.) بەرزین، قەڵتاغ، ئاسن یا دارێکە، کە زینی لێ دروستدەکرێ.

**قەڵتاخەکۆن:** بریتییە لە مەردومی پیری ڕزیو.

**قەڵتاغ:** چووار دارە بە چەرمی خاودا دەبەسترێ و دەخرێتە سەر تەکەڵتووی زین، قەڵتاخ.

**قەڵتاغ لێدان:** زین کردنی وولاخ.

**قەڵتاندن:** دەرکردن، ڕاڕفاندن.

**قەڵتە** (ئەردە.): قورمساخ، ژنحیز. (ئەردە.) پیرەژن، قەڵتاخەکۆن.

**قەڵتەبان:** شڕو شڕۆڵ، پیس و چڵکن، شل وشۆڵ، بێ شەرم، (هەورا.) ڕیپاڵ، مەردومی نەفام.

**قەڵت وبڕکردن:** هەڵپەرداوتن.

**قەڵچخ:** دروو و چقڵ، قرچخ، قڵچخ، قاڵچخ، تیسماڵکێکی تەنک و باریکی دار یا قامیش و گسک و نیدیکەیە. گوڵی گیای کەرخنکێنە و دەخل و ئیتر ـ ە باریکەکانی گوڵی گەنم و جۆی ووشک، بژ، بژی، داسوو، قەڵداس.

**قەڵخ:** پێستەی گیانداران، کەوڵ. لەڕ، لاواز، لەجەر(بۆ ناژاڵ و ماڵات).

**قەڵخان** (هەورا.، کە.): مەتاڵ سوپەر، قەڵغان. (موک.) گیایەکی درواوییە لە هەموو گیایان بەرزتردەبێ گەڵاشی هەر درواوییە سەری چڵەکانی گوڵی سوور دێنێ وەکوو مەخمەرییە. ـ ی: تیرەیەکە لە کوردەکانی کوێستانێ.

**قەڵداس** (هەورا.، موک.): قڵچخ، بژی گوڵەگەنم و جۆو ئیتر، (شا.) داسوو، داسی، بژانگ، قانچک، قەڵاس.

**قەڵداسوو** (شا.): قەڵداس.

**قەلزین** (باک.): خلیسکان. (باک.)خۆشاردنەوە.

**قەلس** (زا.): لاواز، لەڕ، چرووک. ـ ی (باک.): بندەستی و پەرێشانی، تووڕەیی. ـ بوون: مەرزبوون، هەرپەندمان، قالس بوون.

**قەڵس:** (کە.) قرس، جاڕس، قەرس، مۆڕ، تووڕە، پڕ ڕق، بەڕق، ڕقدار، قالس، زوویر، قاس، ئالۆز. ـ ی: قالسی، تووڕەیی. ـ کردن: تووڕەکردن، هەرپەندماندن، قالسکردن.

**قەلسۆک:** لاواز، بێ هێز.

**قەڵش:** قڵیش، قەڵشت، قەلش.

**قەڵشان:** داقەڵشان، (باک.) پەرچڤین، قەڵشین.

**قەڵشاندن:** (باک.) پەرچڤاندن، داقەڵشاندن، قڵیشاندن.

**قەڵشاو:** دەرزی، قەڵشاو.

**قەڵشین:** ـ ی پێستی دست وپێ: تەرەکان، بەرقتین، (باک.) کەوتین، شەق بردن، ترەکان، پەرچڤین. ـ ی دار لەسەر باری درێژی، بۆ دەرمانی وی ماست و خووێ باشە.

**قەڵشیو:** قەڵشاو، دەرزی، قەڵشاو.

**قەڵغان:** چتێکی گردی پانە لە چەرمی ئەستوور دروستدەکرێ و لەکاتی جەنگیدا دەکرێ بە بەرهەڵستی شیرو تیری دوژمن.

**قەڵغان بازی:** بەکارهێنان و هەڵسووڕاندنی قەڵغان زۆر بەباشی.

**قەڵغانە:** نەخشێکە لەوێنەی قەڵغان دروست دەکرێ لە چیغیدا.

**قەڵفەز:** بە ـ چوونی جلک و کاڵا. قەڵپەزە، تاڤگە.

**قەلفرکردن:** مەبەس لە دەربازبوونی یەکێک.

**قەلقولە** (زا.): لووتەوانەی دەرگا.

**قەلقیشک** (باد.): قەلەباچکە.

**قەلکردن:** پەلکردن، کەلکردن، هەڵپاچین و قرخ کردنی موو، بڕین، کەلکردن.

**قەڵمسەنگ:** قۆچەقانی.

**قەلمسە:** قۆچەقانی.

**قەڵمسک:** قۆچەقانی.

**قەڵمسن:** قۆچەقانی.

**قەڵمسنگ** (جا.، کە.، دەر.): قۆچەقانی.

**قەلراو:** مەلێکی ڕەشی مەلەوانی ماسی خۆرە، ماسیگرە.

**قەلنە:** قەننە، قەنگە.

**قەلنۆشە:** تۆوی کەنگرییە بە خووێ وە دەبرژێ و دەخورێ.

**قەلوەز** (جا.، هەورا.): پرژ، تاڤگە، سوولاڤ. (جا.، هەورا.) کەنداڵ، کەند، پەرتگە.

**قەلوەزە** (ئەردە.): قەڵبەزەی ئاو، تاڤگە.

**قەلۆغان** (کۆ.): گیایەکە هێندەی گوڵەبەڕۆژەیەکی بڵنددەبێ، بە سووتاوی و بەڕۆنەوە لەبرین بدرێ دەیبرژێنێتەوە و چاکیشی دەکاتەوە.

**قەلۆک:** بچووککراوەی قەل.

**قەلۆکە** (خۆ.، کۆ.): پۆلکە.

**قەلۆکاگۆز** (خۆ.): پۆلکەگایانە.

**قەل وبەرد:** مەبەس لەدەست تەنگ بوونی یەکێک بە جۆرێکی کەدەستی بە پوولێکەوە بلەرزێ، سەرهەنگ کەوتۆتە قەل وبەرد.

**قەل ودەل:** قسەزانی بەدەم وپل، زووانداد. کورت وشیرین.

**قەلوولوو لوو** (ئەردە.): چاوشارکێ.

**قەلوون** (کە.، باک.): قەننە، قەلیان.

**قەلهاندن** (باک.): کولاندن، وێرانکردن، ڕووخاندن.

**قەلهین** (باک.): وێران بوون، ڕووخان، کولین، کولان.

**قەلیان:** قەنە، قەننە، قلیان، (باک.) کولین، کولان.

**قەلیاناوی** (هەورا.): نێرگەلە.

**قەلیاندار:** (باک.)بەردەفکر.

**قەلیانقۆز** (هەو.): (کۆک.) بۆشناخ، (هەو.) قەننەقۆز.

**قەلیەشار** (دزە.): جوورە گیایەکە چۆغانی پێدەلێن بۆ سابوون دەبێ. دەرمانێکیشە.

**قەلێپ** (هەر.): گیایەکە.

**قەڵێتە** (دەر.): قەڵادەی ملی سەگان، تۆق، قەڵاتە.

**قەلێر** (باک.): چڵک، گەمار، قرێژ.

**قەڵێتە** (باڵە.): جوورە ترێیەکە وەکو توڵخی وایە و پێستی تەنکە.

**قەلی** (باک.): قاورمە.

**قەلیتە** (باڵە.): جوورە ترێیەکی پێست تەنکە وەکو توڵخی وایە.

**قەلیسێڵ** (باک.): بەربەسێڵ، کەبابی نێوساجی. (زا.) گۆشتێکی برژاوە، کە ماست و شیری بەسەردا کرابێ.

**قەلیشتەک** (باک.): قەڵشتی چکۆڵە.

**قەلین** (باک.): قەلیان، قەلوون.

**قەلینجەک**: قامکە توتەڵە.

**قەم**: دارێکی ناو کۆڵراو و هوڵوڵە یا تەنەکەو چتێکی ترە وەکووی و درێژە لە شوورێنێکی بەرزەوە بۆ بەرزاییێکی تر ئاوی پێدا دەپەڕێننەوە. (کە.) دۆڵ، شیو، دەرەیەکە ئاوی شاخانی پێدا بڕوا. (کە.) دۆڵاش (دۆڵاشی ناشی). (کۆ.) قانگ (بۆ توور)، پووتی توور. دارێکی گەورەی ناو هەڵکۆڵراوە ترێی تێدا دەکوشرێ.

**قەمار**: قومار.

**قەمامە**: (کە.) قومامە، جوورە دروومانێکە.

**قەماندن** (باک.): دار ووشک کردنەوە بۆ سووتاندنی.

**قەمان**: پرتووکان، (هەو.) پرتووخان، جلکێک یا هەر جوورە کاڵایەکە تینی ئاوری زۆری کار لێ کردبێ و نزیک بە سووتانی بێ و هەر بە سووتاویش دەژمێردرێ سا بە ئاگر یا بە هۆی هەر چتێکی تر ڕووی لە ڕزانێ کردبێ.

**قەمە**: قەمە، قەسەتۆرە، تیغێکی درێژی دەم پانە نانوشتێتەوە و کەوانە نیە.

**قەمەر** (باک.): ڕەنگێکە لەنێوانی سوور و ڕەشی دایە بۆ مایین و ئەسپ، (باک.) قەمەل. (باک.) مەڕێکە سەری وەکو تیکوڵی بەرووی بێ. ــ ی: جوورە پارەیەکی کۆنی کەم نرخە وەکو شایی، چەرخی، ئانە، فلس.

**قەمەری** (باک.): ناوی سترانێکی کوردییە.

**قەمەزەن**: فێڵباز، ساختەچی، بێ ناموس.

**قەمەڵ**: (باک) سن و کیسەڵە، کە لە دەغڵ و دان دەدات.

**قەمەلاخ** (باک.): ڕاوەکەوە لەسەر بەفری.

**قەمبەرە**: نارنجۆک.

**قەمت**: شەنگڵە بەرەکەتەی گوێزییە واتە دوو گوێزەکە پێکەوە نووسابێ. (باک.) گچکەی وی قەمتکە: ئێخە، یاخە، بەکراسەوەیە.

**قەمتار** (ئەردە.): کەمتیار، کەمتار.

**قەمتاندن** (باک.): چەسپاندن، پێوە نووساندن.

**قەمتەر**: جوورە لغاو و زار بەندێکە لە دەمی سەگان و ئێستر و مەیموون دەکرێت، پۆزەبەن، دەم بەس تا چت نەخۆن و سەگ و مەیمونیش نەگەزن. ــ بوون: برێتییە لە زۆر ڕژدی یەکێکی بە جۆرێک کە دڵی نەیەت هیچ بخوات. ــ کردن: قەمتەرخستنە ناو دەمی سەگ و مەیموون و ئێستر و ئێستر بۆ دەمکوتکردنی یەکێکیش بەکاردەبرێ. ــ ی: مەبەس لە کەسێکییە زۆر ڕژدبێ هیچی بەدەمیدا نەچوو بێ.

**قەمتەرە** (موک.): بڵندایی و تخووب و سنووری نێوانی دوو زەویانە سا لە بەرد یا لەگڵ دروستکرابێ، (ڕەوا.) چیلە، (باک.) بەلک، بەنک. لە شێوەی موکریانی کۆندا ئاوێکە وەسەرەوەی پردێ بکەوێ و بەسەریشیدا تێپەڕێ. بەرگرتنی جۆگەلە ئاوە بە قات قات بەرد و گەڵاو گیا و پلووسک دانانە لە هەموو چینێکیدا تا ئاو بە هێواشی دارژێتە خووارەوەو زەوییەکەی دانە دڕێ.

**قەمتک** (باک.): (باک.) قەنتک.

**قەمچ**: هەڵپاچینی داران بە مقەست. (بڵ.، ئاکۆ.) نیشانەیە بەو جوورە کەمێک لە تووکی ئاژاڵ یا ماڵاتان دەبڕن بۆ نیشانەکردنیان. ــ کردن: نیشانەکردن. (دەر.) ــ کردن: ڕێکخستن و بڕینەوەی زولف و پەرچەمانە. (جا.) بەدزیەوە بۆ لای نێچیران چوون تا دەگەنە بەرانبەری یا نێزیکی بۆ لێدانی. (هەو.) کەوتنە بەرقەمچ: کەوتنە بەر دەست، کەوتنە بەرچاو، کەوتنەبەرهەل، بەرچەنگ، (باک.) لەورێچ. خووارایی، پێچ. ــ کردن: هەڵپاچینی موو بە مقەست. ــ ی: فەرمان، دەستەڵات: لەبەر ــ ی مەنگوڕاندایە: لە ژێر دەستەڵاتی مەنگوڕاندایە، قامچی، شەلاخ، قایشێکی هۆنراوەیە سووار چارەوێی پێ لێ دەخوڕێ، شەلاخ، نەقیزە.

**قەمچان** (لو.): هەڵمەقۆ. گەمەیێکی ناسراوە پارە یا زیخی فڕێ دەدەنە ناو هەوا بەدەستی دەیگرنەوە.

**قەمچاندن**: پێچدان.

**قەمچک** (باک.): کلێنچکی بزنی.

**قەمچ و پێچ**: گەوە، خووار و خێچ.

**قەمچوورە** (باک.): ماڵاتێکە لەمێگەلان دەسێنرێت.

**قەمچووک**: بریتیە لە تیکەنان وەکو کەوچک دەمی دێتەوەیەک ماست و شلەمەنی پێدەخۆن، قاپووچکە.

**قەمچوولە** (ڕەوا.): بەربەنە، ژێرچەنە، لەبەن یا لەقەیتان لە زێڕ یا لە زێو دروستدەکرێ.

**قەمچێن**: جوورە گەمەیەکە هەندێ وورده بەرده یا پارە لەبەری لەپدا هەڵدەدرێ و بە پشتی دەست دەگیرێتەوە دیسان لەپشتی دەستەوە هەڵدەدرێتەوە بە بەری لەپ دەگیرێتەوە تا چەند جاران بەم جۆرە هەڵمەقۆ.

**قەمچین**: قامچی.

**قەمراندن** (باک.): برژاندن، سوورکردنەوە.

**قەمزە** (کە.): ووتەی خۆش و ئاخۆتنی پڕ لەسوودایی لەگەڵ ژنان کردن. غەمزە. ــ نوشتە: قەبزە نوشتە.

**قەمسئوون** (باک.): فرت وفێڵ. فێڵ وفەرەج.

**قەمک**: قامک. (ئەردە.) دزی چالاک، دزی ناقۆڵا.

**قەمکە** (ئەردە.): دزی چالاک.

**قەمووچکە** (ڕەوا.): لغاوەی زار، لغاوەی کەوش و ووڵاغ.

**قەموور**: قەمبوور، مرۆی کووڕ و پشت دەرپەڕیو و مل بە ناودا چوو.

**قەمووشک** (باک.): مەیین و بەستنی خووێن.

**قەمهاندن** (باک.): لەناوبردن، لەدەستدان.

**قەمهین** (باک.): لەناوچوون، لەدەستدران، لەدەستچوون.

**قەمی** (بار.، باد.): بەڵکوو، لەوانەیە، وەدەبێ.

**قەمیچەک** (باک.): چین، چالآیی ڕوو.

**قەمیش** (هەو.): قامیش. (هەو.) سیرەت. (هەو.) بەرماخی تونچکدار.

**قەن** (هەورا.): قەند، شەکری کەللە یا کولّو.

**قەنا** (باک.): هەرنەبێ.

**قەنات**: کاریز. (ئەردە.) شیرینی ساز، شەکرۆکە فرۆش.

**قەنار** (فە.): خورێنێکە دووای ماوەییێکی ڕەش هەڵگەڕابێ.

**قەنارە**: سێدارەی مرۆخنکاندنێیە، (هەو.) قنال. بە دارێکی درێژەوە چەند قولابێکە سێدارەی گۆشت فرۆشانە ئاژاڵی سەربڕاوی پێوە هەڵدەواسن لە دووکاناندا بۆ فرۆشتنی گۆشتەکەی.

**قەناری** (ئەردە.): باڵندەیەکی دەنگخۆشی گچکەیە، کەناری، کەنارە.

**قەناس** (ئەردە.): قەنگاس، شەفتول، ئەو پارچە زەوییەیە سووچەکانی ڕێک نەبن وەکو یەکتری.

**قەنە**: قەننە، سەبیل، قلیان، قەیلوون، قەلوون، قەلیان، قەلیوون، جوورە سەبیلەیەکە دەسکێکی درێژی پێوەیە لەجیاتی جغارە تووتنی پێ دەکێشرێ، ــ کێشان. (شار.) قنە، قدیلکە، قدیلانە، (کۆ.) قتیلە.

**قەنەدار**: قەنگەدار.

**قەنەفە**: کورسییێکی تەسکی درێژی تەنیشت و پاڵ پشت دارە لەسەری دادەنیشن.

**قەنەفل**: مێخەک.

**قەنەفل بەند**: خشڵێکە برێتییە لە ملوانەییێکی گۆیەکی زلی پێوەیە و مەرجانی تێدەخرێ لە ناوەندیشیدا قاپشێکی بەردە لە زێڕی پرپەردار گیراوە و لە قاپشی دەکرێ و قاپشەکەش نەخشاوە سەرەکانیشیان بە نێرومێییە لێک گرێ دەدرێن.

**قەنەفلێ** (هەورا.): گوریسی تەنگەی کۆپانییە.

**قەنەواچە**: تەنراوێکی کەمێک ڕەقە دەخرێتە ناو دوو تووێی کالآوە بۆ جووان وێستانی.

**قەنەووز**: خامەک، تەنراوێکی ئاوریشمینی تەنکی جووان و لووس و پووس و بریقەدارە.

**قەننەدار**: کەسێکە، کە هەر قەننە بۆیەکێکی تێ بکات.

**قەننەدرێژ**: کەسێکە قەننەی درێژ بکێشێ.

**قەننەرێژ**: تووتنی هەڵتەکاوی پوختەکراو.

**قەننەقۆز**: قەلیانقۆز.

**قەننەکێش**: قەندەکێش، قەنگەکێش.

**قەننەی ئاوێ**: نێرگەلە.

**قەنتەر**: دەست بەند، سەربەند، پاشبەند، بەدووسەرە بەستنەوەی ئەسپ.

**قەنتەرە** (باک.): کەشتی نووح، سەرچاوەی ئاوی.

**قەنج** (شکا.، باک.): قنج، چاک، باش، جووان، چتی باش. ــ بوون. ــ کردن. ــ ی: جووانی، دەلالی، ئالووسی، باشی، چاکی، قەنجیتی، چاکە.

**قەنجتر**: باشتر، چاکتر، خاستر. ــ ین: باشترین، چاکترین.

**قەنجۆ** (باک.): ناوی پیاوانە.

**قەنجی کار**: چاک، چاککار.

**قەند** (کرما.): سەرۆک، دەمڕاست. شەکری کەللە، شەکری ڕەق، چەخموور، شەکری کولّو.

**قەنداخ**: شەکرو ئاوی لەکوڵێ.

**قەنداغ**: قەنداخ.

**قەنداری** (باک.): قەندەهاری.

**قەندان**: شەکردان، شەکردانک.

**قەنداو**: شەکراوی ژنخوازتن، قەنداف، قەنداو.

**قەندە**: قەنگە.

**قەندەهاری**: قەندرای، جوورە گەنێکی باشە بۆ نان لە حومەیرەی سپی ترە و دەنک ووردی بە پێزە، گەنم سێ جوورە: سابریەگی. یەخەدادڕای. سوورکەلّە.

**قەندرخە** (باک.): گیایەکی زیاندەرە لە هەر جێگایەکی شین بێ دەغڵ و دانی تێدا پێ ناگات، ئەویش بڵند دەبێ و زۆر وەگەنمی دەچێ بەلآن بێ بەرە.

**قەندشکێن**: شەکرشکێن، جوورە چەکوچێکە قەندی پێ دەشکێنرێ، چەکوچی قەندشکاندنێ.

**قەندیل**: کێوێکی بەناوبانگە. نێوی نێرینانە. جوورە چرایەکە، چرادان

**قەندیلە**: نۆکی کولآو، قوتیلە.

**قەنگاس**: ژوور یا جێگایەکە سەرێکی پان و سەرەکەی تری تەسک بێ.

**قەنگە**: بڕوانە قەننە.

**قەنگە ڕەشک** (دزە.): لاسکە گیایەکە بەلق و پۆپەوە ووشک بوو بێ، بەدرووی کەنگری ووشکیش دەڵێن.

**قەنگەرێژە**: قەندەرێژە.

**قەنووس**: ڕەش، ڕەشێکی توخ.

**قەنی**: ناوی سەگە وەکو بۆرە، بازە. گیسکی نابووتی پاییزەزێیە، بە هەموو گیاندارێکی گچکەش دەڵێن.

**قەنیلە**: قەندیلە.

**قەو** (فە.): کەوا.

**قەوانی** (باک.): ووتە، داستان، چیرۆک.

**قەواخ**: قاووغی چت، قەپاخ، قەواغ، خلێف، تێکوڵ، پێست.

**قەوارە**: تیەن، بارستایی. (موک.) برینی زۆر گەورە، بەپان و پۆری و قوولآیی برینی گەورە دەڵێن کۆلاو، کەلەبەر. بارستایی، بەرزی خەرمان و چتی تر. قەلآفەت، تیر، بالآ.

**قەوارتن** (باک.): هەڵکەندن، قووڵکردن.

**قەوارۆک** (باک.): بادامی شیرین، (زا.) کاکڵە گوێزی فەریک.

**قەواش**: بچووکێ وێ قەواشکە، سەرێکی وی پان و قولقولییە کوتلک و گۆشت و غارک ژناڤ ئاڤێ پێدەر دەخەن.

**قەواق** (زا.): کەسێکە، کە دیزە وگۆزە دروست بکات.

**قەوال** (باک.، یەز.): مەلای یەزیدیان، ئەوانەن کە هەڵبەستان دەخوێننەوە.

**قەواڵە** (کە.): قەباڵە، قاقانی، لەمل گرتن، بنچاغ، قۆچان.

**قەوان:** قاپوغی فیشەکان. بۆ دەنگ و باسی درۆ و هەڵبەستراویش بەکاردەبرێ. قەوانە.

**قەوانە** (هەو.): قاپوغەفیشەکی بەتاڵ، قاڵکەفیشەک، قاپووری فیشەکە. درۆ دەلەسەی ڕێکخراو. ساف، ساپ، چتێکی گردی تەنکی پانە دەخرێتە سەرسندووقی گۆرانی پێ لێ دەدرێ.

**قەوانچە** (ئەردە.): حەوانچە، پەرت، فرێدان، کەوتن.

**قەوانچەدان** (ئەردە.): حەوانچەدان.

**قەوتاندن** (باک.): دەرکردن، ئازادکردن. بقەوەمینە: دەرکە، ئازادکە.

**قەوتی** (زا.): چاوەدێری و سەرپەرشتی چت.

**قەوتین** (باک.): ئازادکران، دەرکران.

**قەوچاندن:** قەوچەکردن.

**قەوچاندنەوە** (کە.): دووقەدکردنەوە، داهێنانەوە، چەماندنەوە.

**قەوچە:** زار و شەویلکە لێکدانی ماکەرانی بەفاڵە لەکاتی پەڕینی نێرەکەریدا، دەمجووڵە. (سووێ.) گوێرەوسار، هەوسار. ــ بوون: بریتیە لە کەوشەک بوون ــ قەوچ: لەوچەلەوچ، چەنەلێکدان، چەنەلێدان، چەنەبازی، چەنەدرێژی، قەوچەی یەک لەدووای یەکتری. چەندجاران یەک لەدووای یەکتری، قەوچەکردنی ماکەران. ــ کردن: قەوچاندن، بریتیە لە کەوشەک کردنی یەکێک، دەم لێکدانی کەر.

**قەور:** گۆڕ، گڵکۆ.

**قەوران:** گۆڕستان.

**قەوراندن** (باک.): دەرکردن. بقەورینە: دەرکە.

**قەورە** (لو.): بڕبەند.

**قەوورخە:** قەبرغە، کەنار، تەنیشت، چەمک.

**قەورخە:** کەنار، قەراغ، تخوون.

**قەوورسان:** گۆڕستان، گۆڕخانە.

**قەوورکەن:** گۆڕکەن، گۆڕهەڵکەن.

**قەوورکەنگە:** گۆڕکەنگە.

**قەورین** (باک.): دەرکران.

**قەوورهەڵتەکاندن:** گۆڕهەڵتەکاندن.

**قەوزە:** کەڤس، (باک.) لیم، (خۆ.) کەمزووکووز، (پژ.) خورپەجنە، خورپەجندۆکە، (ڕەوا.) کەمز، کووز، (مەنگو.) لیم، جوورە بەڵغ و ملتەیەکی سەوزە لەنێو ئاوی مەنددا پەیدا دەبێ.

**قەوس:** مانگی هەرە دووایی پاییزیە.

**قەوسەلە** (باک.): مەتەڵە، تشتانۆک، مەیل.

**قەوقاز:** قەفقاسە لە ڕاژووری کوردستانێ دایە.

**قەوقەک** (فە.): گمەگمی کۆتری.

**قەول:** بەڵێن، پەیمان، مەرج، گفت. *

**قەولاندن:** قەبلاندن. دەرکردن.

**قەولمق** (زا.): کلتور.

**قەولدان:** بەڵێنی و پەیماندان.

**قەولک** (باک.): بەرگ، کیف، کیسەی تنراو.

**قەول وبڕ:** پەیمان بەستن لەگەڵ یەکێکی بۆ کردنی کارێک. ــ ێ: قەول و بڕ.

**قەوومان:** قچان، پێشهاتن، کارەسات، ڕووشە، گێچەڵ، ڕوودان، شوورەت، بەسەرداهاتنی چتێکی ناخۆش. لێ قەومان: تێمان، ئاوەکوڵ. لێ قەماو: تێماو، ئاوارە، قوڕبەسەر.

**قەوماندن:** هەرا بەرپاکردن، قچاندن، هەڵاییساندنی ڕووداوێکی ناخۆش.

**قەوماو:** ڕووشە، شوورەت، ڕووداوی چتێکی ناخۆش.

**قەومە:** ڕووداوێکی ناخۆشە کە ڕوویدا.

**قەومیان:** قەومان.

**قەومین** (باک.): قەمان، ڕاست.

**قەوی** (هەورا.): ئەستوور، بەهێز، بەتین. زۆر، گەلێک.

**قەویتی** (باک.): ئاگاهی، ڕاسپاردن. ــ لێ کردن: ڕاسپاردن.

**قەوین** (فە.): ئەستوور، (فە.) کولۆفت، قەوی، بەهێز.

**قەوینی پا** (فە.): بەلەک، گۆشتی پشت لوولاکی.

**قەوینی گووپ** (فە.): کوڵمە.

**قەهار** (ئەردە.): بەفرێکی زۆر. (ئەردە.) وێران، خاپوور.

**قەهبک** (باک.): سووزمانی.

**قەهرفرشینک** (باک.): گیایەکە.

**قەهی** (باک.): ئاواوۆک، ئاشنا.

**قەهیکەر** (باک.): گەوج.

**قەی** (باک): بۆچی؟. باک، ترس، بەند، بەن، دەربەند، قەید: قەی ناکا: قەیدێ ناکا. قەی ناکات: واتە ترسی تێدانیە. (باک.) ڕەنگە، لەوانەیە ببێ.

**قەیاغ:** (پژ.) گیاگەفە، گیایەکە وەکو گەغی وایە زستانان بە ووشکی دەدرێ بە وولاخان، گوڵیشی وەکو گوڵەگەغی وایە بەڵان بێ دانە، قەیاغی ئاوێ.

**قەیاخەوان:** کەسێکە، کە قەیاخی ئاوێ لێ بخورێ.

**قەیار** (باک.): کەنار، لێوارە زیادەکەی سمی وولاخی یەکسم تراشین. ــ کرن: بە بڕ بەندی کەری سمی وولاخان ڕنین بە سمتراشی قەراخی سمی یەکسمان تاشین. لێدانی مندااڵ و ئیتر. ــ کردن: بیرازکردن.

**قەیاری** (ڕەوا.): نالی کۆن بە بزماری تازە لە سمی وولاخان دان.

**قەیارە** (ڕەوا.) کەوا یا لێفەیەکیشە، کە ڕووی تازەی لێ بنێنەوە. قەدارە، شمشیر، شیری ڕاستە.

**قەیسە:** کەژوویەکی پانە، پارچە گوریسێک یا قایشێکی لەسەرێکی تێ هەڵدەکێشرێ سەرەکەی دیکەشی ئاڵقەیەکی پێوەیە لەسەر بارەوە تەنگەی وولاخی پێ دەبەسترێ.

**قەیارغ:** قەیاغ، جوورە کەڵەکێکە پێی دەپەڕنەوە لەو بەرەو بەری ئاوێ

**قەیاغەوان:** قەیاخەوان.

**قەیتان:** شەهبەن، (باک.) بەنۆک، لە دەزوو یا ئاوریشم وەکو بەن دروستدەکرێ و لەلێواری هێندێ کاڵا دەگیرێ. ــ ی قۆندرە: بەندی قۆندرە

**قەیتەران:** (هەورا.) چەمەسیاوێ، (ڕەوا.) خالـەڕەش، گیایەکە گـەڵای وەک گەڵای کەنەچووز وایە لاسکەکەی وەک موو باریک و ڕەشە بەدقەشاخ لەناو ئاوێدا شین دەبێ بۆ نەخۆشی گورچیلە زۆر باشە بۆو کسانەی میزی بە ئازار دەکەن زۆر زۆر باشە.

**قەیچاکا:** قەیدی چیە، قەی چ ئەکا؟، چ ئەوێ.

**قەیارە:** قەمە، قەدارە.

**قەیچە:** داری دارە ڕای سەربانان.

**قەیچی** (تی.): مقەست، دووێردک، دووێردە.

**قەید:** قەی: باک، ترس. ـــ ی ناکات: قـەی ناکات. ئاسنێکی تەنکی پانی درێژە تایەی (فەردە)ی کوتاڵی پێ قایم دەکرێ.

**قەیدک** (باک.): مەچی دەستی، ناوەندی قاپ و سمی وولاخییە.

**قەیران:** مارەیەکە لەکات کە لە لایەن پزیشکەوە دادەنرێ بۆ یەکێکی زۆر نەخۆش لە بابەت مردنی یا ڕزگاربوونییەوە.

**قەیرە** (کە.): قەیرە، ئاخێل، کەسێکە لەنێوانی جحێلی و پیری دابێ بۆ نێرومێ بەکاردەبرێ. کارکردە، لەکار دەرهاتوو، ڕاهاتوو. کوڕ یا کچێکە هەر بە کوڕێتی و کچێتی مابێتەوە تا پیر دەبێ.

**قەیسەرقووکردن:** مەبەس لەچاوەڕێیی کردنی یەکێکییە لە شوێنێکی بە تەنهایی.

**قەیسەروون** (باک.): قەیسی ورژن.

**قەیسەری:** ڕێزە دووکانێکـە یـا چـەند ڕێـزە دووکانێکـە کـە سـەریان بـە خەرپشتە (تاق) گیرابێ. لەکاتی پێشوودا بازاڕی وا هی قەیسەری بووە هـەر کەسێ کڕیـن و فرۆشـی تێـدا کردبـا دەبـوو هـەندێک پـارە بـدا بـە قەیسەری.

**قەیسی:** (هەو.، فە.) زەردەلوو، (دەر.) زەردەلـووی، شێلانە، (هەورا.) شیلانێ، شەفتالوو، شلانە.

**قەیسی بادام:** چەوزقەن، چەقالـەی قەیسی دەردێنن لـەجیاتی وی کاکڵە گوێز یا بادامی لەناو دەنێن.

**قەیسیل:** قەرسیل، دەغڵی سەوزی گوڵ نەکردوو.

**قەیسی و ڕۆن:** قەیسـەروون، چێشـتێکە لـە قەیسـی ورۆنـی داغکـرا و دروستدەکرێ.

**قەیسی وشۆربەو:** شۆرباوی قەیسی.

**قەیفە:** قەدیفە: پارچەیەکی چنراوی لووس و پووسی تووکنە.

**قەیک:** قەیاخی سەرواێ.

**قەیلەسێلێ** (برا.): بەربەسێل.

**قەینلخ** (باک.، هەو.): پەنجەوانـە، قامکەوانـەی چەرمـە یـا تەنەکەیە سەپانان لەکاتی دروێنەدا لە دەستیانی دەکەن.

**قەیناکا:** قەیدێ ناکا، زیانی نیە.

**قەیووکردن** (ئەردە.): ڕشانەوە.

**قبالە** (باک.): ئاوێنە.

**قبەقب** (ڕەوا.، خۆ.): ــ ی کەوێ: قاسپەقاسپی کەوێ.

**قبراغ** (باد.): (باک.) قبراخ، هۆ، مایە، بونـە، ئـاوبژی کـار، کەسێکە بکەوێتە ناوەندی دووکسانەوە بۆ یەک خستنیان.

**قبوولی:** جوورە پلاوێکە.

**قپیلک** (دەر.): قـەپێلک، تیکوڵـی گوێـزو بـادام و هێلکـەو کیسـەڵ و ڕەقەو ئیتر.

**قپێلک:** قەپێلک، قپیلک.

**قت:** لابڕیاگ، دەرچووگ، دەرکریاگ، (کـە.) فـت، کـەوتن، کـەفتگ، لاچووگ، نەبوون، نەمان، دوواییی هاتن. لە گەمەی گۆرەوێنێدا دەڵێن ئەم گۆرەوییە قت. قت بوون: فت بوون لەیاریدا. قتکردن: فتکردنەوە.

**قتاو** (ئەردە.): پەڕتووک، کتاو. ــ خانە: قوتابخانە، پەڕتووکخانە.

**قتک** (باک.): قەتێ.

**قت وفت** (ئەردە.): جووڵەجووڵ، قل وبل.

**قتی** (کە.): (کە.) قت.

**قجر** (کە.): چاوخێل، (کە.) چاوگێڕ.

**قجرە** (کە.): گیایەکە تازە سەوز بووبێ. ــ کردن (کـە.): بـە ددانی گیـا بچەڕین.

**قجقیلک:** توورتەڵە، قامکەچکۆڵە.

**قجی:** گیایەکی گەڵاووردی هەمیشـەییە لـە بناری شاخی نمدار دەڕووێ، پنجەکەی زۆر بەکەڵکە بۆ ژانی لێهاتن.

**قجیلە** (لـک.): مەشکەدرە. پنجـە گیایەکـە زۆر وە درکـە زەردەی شـین دەچی گوڵـی زەردە، تا گـەزێکیش بڵنـد دەبێ و دەخورێ، (شن.، سەر.) پیتەلە، (دەر.) قنجیلە، قجی.

**قجیلەشووان:** مەشکەدرە، کوللەی زۆر گەورەیە تەنها شێرەکوللە.

**قجیلک:** قامکەتوورتەڵە.

**قچ** (کە.): لاق، قاچ.

**قچان:** قەومان، ڕوودان.

**قچاندن:** قەوماندن، چتێکی نهێنی ئاشکرا کردن.

**قچک:** بچوک، کچکەلە، چکۆڵە.

**قچی** (باک.): قجیلە.

**قچیلک** (بار.): توورتەڵە، قامکەچکۆڵە، (هەورا.) تووتە.

**قخ:** گخ، پیس، قەخ، کخ، کخە، قخە، قخخە، عیش.

**قخە:** کخە، قەحە، کەخ، گخ.

**قخەقخ:** گخەگخ، کخەکخ.

**قخخە:** ووشەیێکی زاراوەی منداڵانـە، منداڵـی سـاوای پـێ دەگێڕنـەوە لـە دەست بردن بۆ چتی پیس.

**قدەقد** (ڕەوا.): (هەو.) دووڕقەدووڕق، قرتەقرتی مریشک.

**قدغە:** (کە.) ختکە، قدیلکە. ــ دان: قدیلکەدان.

**قدقد:** قدەقد.

**قدۆس** (بار.): بەخت، چارەنووس.

**قدۆک** (بار.): قرقرۆچکە.

**قدیک:** دڵتەنگ بوونی مەردوم.

**قدیلە:** خوتووکە، قدیلکە.

**قدیلکانێ:** خوتووکەدان.

**قدیلکه:** دقدقه، قدغه، ختکه، (هەورا.) ختوکه، ختختە، (که.) ختکه. ــ دان: ختکەدان، دقدقاندن، دەقدەقاندن.

**قدیلکەدران:** دقدقین.

**قر** (باک.): کولانەی مریشکی، بڕوانە قڕپە. (باک.) باڵندەیەکە، سەهۆڵ، زوقم.

**قڕ:** قڕان، مەرگی تێکڕایی، مەرگ ومیر، قات وقڕ، مەرگی گیان لەبەران بەدەستی گەل واته بە تێکڕایی. (ئەردە.) قەلبیر، قەلبیره، خنچکه، ناز.

**قراج** (زا.): زەوییەکە گیای تێدا نەڕوابێ یا کەڕوابێش ئاژاڵ و وولاخ خواردبێتی.

**قرار** (باک.): قایم، مەحکەم.

**قرازەقراز** (دەر.): گارەگار.

**قرازیان** (هەورا.): دروون، دروومان.

**قراش** (ئەردە.): قاشی شت.

**قراش قراش** (ئەردە.): قاشقاش، تواتوا.

**قراغ:** قەراغ، کەنار.

**قرافر** (زا.): قڕەقڕ.

**قراک:** قەلەڕەش.

**قراکە:** باڵندەیێکی سەوزە بەقەد قژاکەییێکی دەبێ.

**قراڵ:** پاشا، شا.

**قراڵێ** (هەو.): گوێزێکی پووچەڵە کە بەدارێکەوە بێ.

**قرام:** گیایەکە پرزەی دەهۆنەوە.

**قڕان:** لەنێوچوون، قەلاچوە، قەراچۆ، قڕتێ کەوتن، مردنی بە گەل بۆ هەموو گیان لەبەرێکی. پارچەپارەیێکی گچکەی زێوینە بایی (٢٠) شایی یانە و هەزار دیناری ئێرانییە. (ئەردە.) نەبوونی و نابووتی، قڕبوون.

**قڕاندن:** جقاندن، دەنگی قەلەڕەشە و بۆقییە کە مەبەس لە نوقلاتەو نەخشەی خراپە. پێپەڵکالان.

**قڕانن** (ئەردە.): قڕاندن، هانای خراو. قڕانی بە گوێچکەیدا: قیڕاندی بە گوێچکەیدا. قڕاندن بەگوێچکەی کەسێکیدا: هەواڵێکی ناخۆش بە یەکێک بگەیەنرێ.

**قراندن:** بەگڵ داپۆشین.

**قڕە:** گاڵە، کێشە، هەراوکێشە، دەمەقڕە، شەکەراو، (ئەردە.) دەنگەشە.

**قڕپە:** قڕ، قڕەقڕ، هەراهەرا، دەنگەدەنگی قەل وبۆقانە. قڕاندن. (ئەردە.) دوواییی، دوواکین.

**قڕەقەپ:** بێ دەنگ بوون.

**قڕەقڕ:** هەراهەرا، کێشەکێش، قڕەی یەک لەدووای یەکتری، قووارڕە، قووارە، قیڕەقیڕ، گاڵەگاڵ، گڕەگڕ، گڕپە، گڕڕ، گوڕڕەگوڕڕ، قووڕقووڕ، قرۆجر، جقەجق. ــ کردن: جەرقین، بەدەنگی قشقەڵەو قەل و بۆق و منداڵانیش دەڵێن.

**قڕەقڕو قوڕواق** (هەورا.): قڕەقڕی بۆقی.

**قرپاق:** بۆق، بەق.

**قرپۆق:** بۆق.

قرپۆق

**قرپۆز:** کەسێکە ڕیشی ماش وبرنج بووبێ.

**قرپوون:** تەفروو توونابوون، قەبڕان، مردنی گیاندارانە بە کۆمەڵی و زۆری.

**قرپ** (موک.): ئێق، هێڵنج، قورپ، قرتک، قرقێنە بای ئاشک. ــ اوی: قرپی دێتەوە. (که.) دەغڵی شین دروون، شکاندن. لق وپۆپکردنی دار، دەنگی بڕین وشکان، (ئەردە.) قرپەی داری شکاو، بڕین، شکان دوورینەوە. تالان: ــ کردن: تالانکردن. دەست بلاوی، خەرج کردنی پارە و بەکارهێنانی خواردەمەنی زۆر و لە ئەندازە بەدەر، ژنی بارامی دەستی بە قرپە. قرقێنە.

**قرپان** (که.): هەڵپاچران

**قرپاندن** (که.): هەڵپاچین.

**قرپە:** قرتە، پرچە، پرت، دەنگی شکانی چت و پسانی دەزوو. دەنگی شکانەوە و بڕینەوەی دارە.

**قرپەقرپ:** قرپی گەورە و زۆری یەک لەدووای یەکێدا.

قرپنە: خرپنە.

**قرپۆک** (خۆ.، هەو.): قرپۆک، پووچەڵ، پووچ، قرپۆق، ئەو دەنکە مێوژانەیە کە زۆر ووشک بێ تام ڕەقەو پووکەو ناخورێ.

**قرپۆڵ:** مێوژی ووشکەڵ، قرپۆل.

**قرپ هاتنەوە:** قرپ کردن، ــ هاتن.

**قرپێنە** (هەورا.): قرخێنە، مرقێنە.

**قرپێن:** ئەو چتەیە کە قرخێنە دێنێتە مرۆی.

**قرت:** مەردومی جلفن، هەرزە. زیندەوارێکی زۆر وورده و بە هەموو چتێکی زۆر ووردیش دەڵێن.

**قرتاڵە** (که.): قەرتاڵە.

**قرتان:** تروکان، تووکان، پچڕانی چت بەهۆی ئەوەوە کە چتێکی وێ کەوتبێ.

**قرتاندن:** تووکانن، چرتاندن، چەتاندن، تووکاندنی تۆو بە ددان بۆ دەرهێنانی ناوکەکەی، بە ددانی تۆو تروکاندن. پساندن، هەڵپاچینی لقی درەختە بەتیغ یا مقەس. بڕینی چت بە مقەست یا بە چتێکی تر. ــ ی مریشک، قرتەقرت کردن، درقاندن، قاڕوو. پچڕاندن، پرچانن، پچەین. لێ هەلقرتاندن، هەڵەو گەڕانن.

**قرتانن:** قرتاندن.

**قرتە:** دەنگی پساندنی دەزوو و چتی تر. پرتە، هەرا، کێشە. شکاندنی تۆو دانەی تر بە ددان. جوورە دەنگێکە وەک دەنگی داخستنی قرتێنە. ــ ی مریشکی: جقەجق، (ڕۆژ.) درقەدرق، دەنگی مریشکی بەکڕە(کورکە) بۆ بانگ کردنی جووجەڵە بۆ چت خواردن. ــ قرت: هەراهەرا، پرتەپرت، کێشەکێش، شوولک، قرتەی یەک لەدووای یەکتری، شۆقک. قرتەی مریشک.

**قرتەقرتە** (ئەردە.): کرکرۆچکە، (ئەردە.) خوڕووچ خوڕووچ، خرمۆچک، خرمۆڵتە، (ئەردە.) خرووچک، کرۆچک.

**قرتەکردن:** درقاندن.

**قرتە لێ بڕین:** لەنێو بردنی چتێک، ئەسپەکە قرتەی لە ئالیکەکە بڕی.

**قرتقرتۆک** (خۆ.): بۆڕی هەوایە، قرقرۆچکە، قورقوڕۆچکە.

**قرتک**: بۆدرن، بۆنێکی ناخۆشە.

**قرتکە** (ئەردە.): پارچەیەکی گچکەیە لە چتی قرتاو، پچرکە، نەختێ، کەمێ، تۆزێ.

**قرتکردن**: برینی چت بە خشتی وەکو مووی ئەگریجە و کاکۆڵ، قرتاندن، قرخ کردنی موو.

**قرتم**: قووتکە، داوە دەزوویێکی کورت.

**قرتماخە**: قەتماغە، گەمرە، کەمێڵی ئاژاڵ، تووێژی سەرەوەی برینان، قەبار، (کە.) قرتمزە، قامووشک، کنی، قەتماخە. گەمرە، کەمێڵی ئاژاڵ، کەمێڵە.

**قرتماخەی گوێچکە**: (ئەردە.) سمراخە، چلکی گوێچکە.

**قرتماخەی لووت**: ڕیپۆق، کەبێڵە.

**قرتمزە** (کە.): قرتماغی برینان.

**قرتووم** (ڕەوا.): گەروو.

**قرت وهۆڕ**: قرتەقرتی زۆر.

**قرتێخستن**: کوژتاری تێکرایی.

**قرتێکەفتن**: قرتێکەوتن.

**قرتێکەوتن**: مردنی ئاژاڵە بە کۆمەڵ و بۆ هەموو گیاندارێکیش بەکاردەبرێت.

**قرتێن**: ئەوەیە کە چتی دەقرتێنی وەکوو مرۆ کە تۆوی دەقرتێنی، وەکو مقەست و گازو ئیتر کە چتی لەت دەکەن.

**قرتێنە** (کۆ.): قرمرۆچکە، قرقرۆشکە، قرتێنکە. دوگمەی کیسەی پووڵ و فیشەکدانانە بۆ کراس و چتی دیش بەکاردەبرێ، کە دادەخرێ قرتەی لێ دێ، چتێکی ڕەقی تەنکە لە ڕەگی ووشک کراوەوە یا ئێسک کە قەڵەمی قامیشی لەسەر ڕێک دەکرێ.

**قرتێنکە**: قرتێنە، ئاوە خورەی مریشک و کەڵەباب کە لەکاتی سەر برینیاندا چەقۆی پێدا دەهێنرێ.

**قرتی**: قرت، جلف، بلح.

**قرتیان**: قرتان، پچران، پچریان.

**قرتیل**: پاشاخوڕ.

**قرجەنە** (باک.): شەم، مێوی سووتاندنێ بۆ ڕووناک کردنی شووێنی تاریک.

**قرجێلی** (دەر.): ژاڵە.

**قرچ** (کە.): دەغڵی درواوە، (کە.) قرچە. چرچ، کرچ، سووتان، چرچ بوون، داخکردنی گوێچکەی ئاژاڵ. لێدانی تیژکەری دووەم لە دەسکەڵای تیلکەری یەکەم لەیاری مەڕمەڕێنیدا کاتێ، کە یەکەم مووشی نەخوواردبێ، قرچان، هەڵقرچان.

**قرچان**: قەڵقرچان.

**قرچاندن**: قەڵقرچاندن بە تینی گەرمایە، چرکاندن، بۆشکاندنی داریش بەکاردەبرێ.

**قرچاندنەوە**: چرکاندنەوە.

**قرچانن**: قرچاندن، هەڵقرچاندن، داغکردن، کرچاندن. داخکردنی گوێچکەی ئاژاڵ، یا پتر گەرم کردنی ڕۆن بۆ گرتنی دۆک و پیسی.

**قرچاننەوە**: برژاندنەوە، کرچاننەوە.

**قرچاو**: ڕۆنی هەڵقرچاو کەلە سەرئاگر داغکرابێ.

**قرچە**: پێخوویی گەنم و جۆ لەکاتی گێرەدا لە ژێر پێی گاگێرەدا پەڵخوڕ بووبێ و تەواو نەکوترابێ. چرکە، کرچە، دەنگی شکانی دارانە و برژاندنی برێشکە لەسەر ئاوور. ــ چۆقە، سووتیان، سووتان.

**قرچەی دڵ**: کرزەی دڵ. ــ لێ هاتن: چزە لێهاتن، پێوەدران. ــ ی گەرمای هاوینێ و ئاوری: کتیسک، کاتی گەرمای نیوەڕۆ.

**قرچەشکێن**: شکاندنەوە، هارینەوەی چت بە تەواوی، قرچە، قرچەشکێن، پەڵخورد بوونی کرشەی خەرمان بەگێرە.

**قرچەقرچ**: کرچەکرچ، چرکەچرک، کەلەکەل. ــ ی دار لەشکانێدا: شرقەشرق. سووتان، دەنگی سووتانی خووێ و چتی تر لەئاوریدا، دەنگی سووتانی فتیلەی چرای گەرچەکی کە تەڕ بووبێ یا دەنگی ڕۆنی لەسەر ئاوری یا کاتێکی ئاوی لێ بڕشێنن.

**قرچ بوون** (موک.): قرچ هەڵاتن، (باک.) تەڤزک، وێکهاتنی چەرم لەبەر تینی گەرمایە، (باک.) قووفلین.

**قرچخ**: قڵچخی گەنم و جۆو ئیتر، ڕیشووە باریکەکانیەتی.

**قرچک** (دزە.): ئەستوندی نیوەڕاستی گوڵەگەنم و جۆو ئیدیکەیە کە دانەکانی بە دەورەوەن.

**قرچنای** (هەورا.): هەڵقرچان.

**قرچ هەڵاتن**: قرچ بوون.

**قرچ**: کرچ، چرچ و سیس و هەڵقرچاو.

**قرچۆک**: دەستگرتی، دەست مچی، هیچ و پووچ، چرووک، نەگریس. دارو بەن و دەزووی ناقایم. ــ ی: چرووکی، نەگریسی.

**قرچۆڵ**: چتی ووشک بووەوەی چرچ، (ئەردە.) قرخۆڵ، ووشکە وبووگ، لەڕ، لاواز.

**قرچۆڵە**: قرچۆڵ.

**قرچ وبرێژ**: قرچ و هۆڕی چت لەسەر ئاوور.

**قرچوون** (باک.): چیرە لە ددانەوە هاتن.

**قرچ وهۆڕ**: (ئەردە.) قرچ وبرێژ.

**قرچهەڵاتن**: چرچ هەڵاتن، چرچیان، قرچیان.

**قرچ هەڵێنان**: قووفلاندن.

**قرچیان** (ئەردە.): هەڵقرچان.

**قرح** (ز.): نەنگی هەموو چتێک.

**قرخ** (کە.): برینەوەی خوری ئاژاڵانە بە ووردی. هەڵپاچینی سەر لق و پۆپی درەخت. گۆزە و کووپەڵەییێکە لەبەر تاو زۆر تێکردن لووس بووبێ. تووکی سەرو ڕیشێکە، کە زۆر کورتکرابێتەوە. مەردومی لەڕولاواز و قرچۆڵ. ئاوی وێستاوی لێڵ ولێخن.

**قرخاندن**: قرخەکردن.

**قرخە**: خرە، لرخە، خرینگە، دەنگێکە لە گەرووی گیاندارەوە دێ لە کاتێکا، کە چتێکی تێگیرابێ.

**قرخـەقرخ** (کـە.): لۆخـەلۆخ، خرەخر، لرخـەلرخی گـەرووی نـەخۆش، خرینگـەخرینگ، خرکەخرک، قرخەی یـەک لـەدووای یـەکتری. ـــ کـردن: لرخەلرخ کردن.

**قرخەمەرەسێ**: ڕاکێشانی یەکێک بە زۆر و لە دوو نەچوونی.

**قرخکردن**: لە بنە کۆتەرەدانی مووی ئەندام.

**قرخن**: کـەس و هـەمـوو جووره گیانداریکـە، کـە زۆر بقرخێنـێ، (ئـەردە.) قرخ.

**قرخنە**: قرخن.

**قرخۆڵ** (ئەردە.): قرخن.

**قرخۆڵە** (ئەردە.): قرخن.

**قرخ و هۆر**: قرخەقرخی زۆر.

**قرخێنە**: ئەو دەنگەیە، کە لە گەروو دێتـەدەرەوە لـەکاتێکیدا، کـە چتێکی لە گەرووی گیرابێ.

**قردان**: قوون بادان لـەسەماو هەڵپـەرکێدا. هەڵسووڕاندن و چـەرخدانی سمت لەکاتی سەمایەدا.

**قردێڵە**: تیلمە تەنراوێکی جوانە کچان لـە مووی سـەریانی دەدەن دووای داهێنانی تا تێک نەچێ.

**قرژ** (مەنگ.): ئاڵۆز، تێکچوو، ئاڵۆزاو، بۆ مرۆ و هەموو چتێکی دەبێ.

**قرژاڵ**: (بـاک.) جوولـەبڕ، (زەن.) قرژانـگ، (بـاد.، زا.) کیڤژاڵــە، کێمجاڵـە، گیاندارێکی ئاوییـە لـە بۆق گـەورەترە بـە دووسـەران دەڕوات لەنێو بێگاناندا دەخورێت، مێملـی ئاوی جۆگەیـە هەمیشـە جۆگـەی ئاوێ کوندەکات کشتیار وەڕەسە بە دەستیەوە.

**قرژالانێ** (هەو.): گـەمـەیـەکی منداڵانـەیـە بـە ئاوەژوو لـەسـەر چوار پـەلان ڕۆیشتنە.

**قرژاڵە** (ڕۆژ.): ژاڵە، رووڵک، لوورک.

**قرژاندن** (سوور.): ڕۆن هەڵقرچاندن، (هەورا.) قرچناى.

**قرژانگ** (ئەردە.): قرژاڵ، (ئەردە.) قارژنگ، کۆنگرە (بورجی قرژاڵ)، بورجی چوارەمی چەرخە.

**قرژە**: یەکێکە لـەبەری دارەمازوو دەباخی پێ دەکرێ.

**قرژێلی** (دەر.): ژاڵە.

**قرس** (هەو.): قەڵس، زوویر، (هەورا.) خرس. (هەو.) خەمل.

**قرسان** (کە.): ترنجان، خرسان، بەحاڵ چوونە ژوورەوە، تەخمین.

**قرساندن** (کە.): گەر، (دزە.) قەرساندن، تەخمین کردن. ددان لە چیرەوە بردن. (کە.) تێ ترنجاندن، خرساندن.

**قـرش** (زا.): پووشـی هـەڵوەریو، لـق و پۆپـی درەخـت کـە لـە خۆیـەوە هەڵوەریبێ.

**قرشە** (دزە.): دەغڵێکی ووشکە جا بە پێوەبێ یا دروواوبێتەوە، کرشـە، لـە هـەندێک شوێنیشـدا دەغڵێکـی دروواوە لــە شـوێنێکیدا بـۆ کوتـانێ کۆکرابێتەوە، (کە.) قرچە. کرشە.

**قرشەشکێن**: نیوەکوت، قرچەشکێن، قرشـەیێکە تـەنها بووبێتـە چـەند پارچەیێک بەلاَن وورد نەبووبێ.

**قرشەکوت** (هەو.): خەرمانێکە بۆ جاری یەکەمین گێرە کرابێ.

**قرغۆ** (باد.): کۆلارە (باڵندەیێکە).

**قرف** (باک.): دارێکە.

**قرفۆک** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**قرقە**: قرەی بۆقی.

**قرقەقرک** (فە.): قرەقری بۆقییە.

**قرقەمێ** (هەورا.): قوڕقوڕاگە.

**قرقر** (کۆ.): باڵندەیێکە.

**قرقرە** (هەورا.): غەرغەرە، چەرخی گچکە.

**قرقرتە**: قرقرۆچکە.

**قرقرتۆک** (خۆ.): قرقرۆچکە، قرقرتە، بۆری پشوو، کرکراگە.

**قرقرک** (باک.): کرکرۆچکە.

**قرقرۆچکە**: قنۆک، گەرگەرە، قرقرتـۆک، (خـۆ.) قامیشـە، (هـەورا.) قوڕقوڕاگـە، (پـیر.) کـرۆژ، (کـۆ.) قرتێنـە، کـاکرێ. بـۆری هەوایـە بـە جەرگەوە نووساوە.

**قرقرۆک**: قوڕقوڕاگە.

**قرقێنە** (هـەورا.): (هـەورا.) قرپێنە، قرخێنە، دووای تێرخواردن قرپ هاتنەوە، بایەکە لە ژوورەوە هەڵدەقوڵێ و بەدەنگەوە لەدەم دێتەدەرەوە.

**قرقیلە** (شا.): (شا.) لۆتە، ئەو دەنکە مێوژانەیە نابنـە مێـوژ بـە بێژنـگ جووێ دەکرێتەوە و بۆ خۆشاو دەست دەدەن.

**قرک** (باک.): قەلەڕەشە. (زا.) قورک.

**قرکردن**: (باک.) قەبڕاندن، قڕان تێخستن، قڕ تێخستن.

**قرگ** (مەرگە.، باک.): تەرەکارێکی مەیلەو خڕە وە خەیاری پتر دەچێ. گەروو، قورگ.

**قرم**: مرق، (بابا.) مرخ. ـــ لێ خۆشکردن: مرق لێخۆشکردن، نیـاز، هەوەس. گوژەنگ، دۆزنج.

**قرمـان** (خـۆ.): پێکەوەنووسـان، بـۆ زار پـتر بـەکاردەبرێ، کەسـێکی نەخۆشێکی وا بگرێ کـە دەمـی لێـک نەبێتـەوە دەڵێـن دەمـی قرمایـە. (باد.) سڕبوون لەسەرمان. دەسم قرمایە: دەستم سڕبووە.

**قرمـاندن**: تەقـەکردن، تەقـەیێکی زۆر بـە چـەکان کـردن. سـڕکردن، هەڕەشەکردن، خوڕین بە دەنگی بەرز لە یەکێک: تێی قرماند.

**قرمە** (موک.): جوورە دروومانێکە. دەنگێکە وەک دەنگی شکانی داری گەورەیە بە گردەبڕی. (کە.) جوورە دەمانچەیێکە. شەقەی چەکانە، چرکە، گرمە، قرپە.

**قرمەی چەکان**: دەستڕێژ، قرمەی یەک لـەدووای یـەکتری، قرپـەقرپ. ـــ ی شکانی دارو بار: قرچەقرچ.

**قرمچ** (باد.): گرژ، ژاکاو، سیس، گەچراو، گێچراو، چرچ. (باد.) ـــ ی: چتێکە، کە سیس و چرچ بووبێ.

**قرمزن**: دەنگی تەق و هۆڕی چەکانە بە زۆری.

**قرم قایم بوون**: نیاز توندبوون.

**قرم قایم کردن**: نیاز قایم کردن.

قرژاڵ

**قرم و هۆڕ:** قرم و هووڕ: قرمەقرمی زۆر، گرم وهۆڕ.

**قرم خۆڵێخۆش کردن:** مرخ لێخۆشکردن.

**قرنابیت:** گیایەکە بە تۆو دەچێنرێت نێرتکەکەی دەکرێتە ناو ترشیات و دەشکرێتە چێشت.

**قرناتە** (کە.): کەرەنا، جوورە شێپوورێکە لە کەرەستەی مۆزیقەیدا.

**قرنە** (ڕەوا.، خۆ.): قرنوو، میچ.

**قرنەو:** قرنە.

**قرنجان:** قنجان، جێگایەکە لە لەش یا لە جلک، بە بەردی یا بە چتێکی تر بکوترێ و کەمێک بریندار بێن. ڕووشان و بریندار بوونی چت.

**قرنجاندن:** ڕووشاندن و بریندار کردنی چت.

**قرنجانن:** قرنجاندن.

**قرنجیان:** قرنجان.

**قرنگە:** خرنگە.

**قرنگەقرنگ:** خرنگەخرنگ.

**قرنگ وهۆڕ:** خرنگەخرنگی زۆر.

**قرنۆک** (سوور.): چرووک، بەرچاوتەنگ، قرچۆک.

**قرنوو:** میچ، کرنە، (هەو.) قرنە، (باک.) قرنی، لەگەنە گچکەتر و تەنک و خڕو پێی زۆرە.

**قرنووس:** لەچەر، بەرچاوتەنگ.

**قرنی** (باک.): قرنوو.

**قرۆجر** (باک.): قرەقڕ.

**قرواق** (هەورا.): بۆق.

**قرووچ** (باک.): ماودا، نێوانی دوولێوان.

**قرووزەقرووز** (هەورا.): کرووزەکرووز.

**قرووسکە:** نووسکە، دەنگی سەگییە لەکاتی ئازار پێگەیشتنیدا.

**قرووقەپ:** دەم قووچاو، بێ دەنگی. ـــ کردن: دەم قووچاندن، دەنگ نەکردن.

**قرووقەپۆز:** ووتەیەکە لەڕووی سووکییەوە بۆ دەم و پلی ناشیرینی یەکێکی بەکاردەبرێ.

**قروومە** (ڕەوا.): هەرووگیف، وتەی زل.

**قرووینمقـر:** کاڵایەکە ژنان دەیپۆشن چین چینە و هەرچینەی لە جوورێکییە.

**قرهاتن:** قڕتێکەوتن، لەناو چوون، تەواوبوون.

**قرێیەکان** (ڕەوا.): گەورەکان، بەرزەکان.

**قرێژ** (باک.): چڵکی لەش و جلوبەرگ، پیسی. ماڵ، دارایی، سامان، دەوڵەت. (باک.، باد.) خڵتەی مۆدنەو دارقەننە و نیتر، کرێش، چڵک، چتی جڵکی. ـــ ی: چڵکن، پیسکێری.

**قرێژاهی:** کرێژاوی.

**قرێژێتی:** چڵکنی.

**قریشان** (موک.): گیایەکە.

**قرییک** (باد.): سێ شەشی بەهار.

**قریشتە:** دەنگ، هەرا، هووریا، هەڵلا، بەقیرەی مریشک و کەڵەبابانیش دەڵێن.

**قریشتەقریشت:** دەنگەدەنگ، قریشت و هۆڕ.

**قریشـت وهـۆڕ:** هەراهـەرا، هـەڵلا هـەڵلا، گرمـەگرم، دەنگـەدەنگ، قریشتەقریشت.

**قریشکە:** دەنگێکە لە قیژە گەورەترە.

**قریشکەقریشک:** قریشکەی یەک لەدووای یەکتری.

**قریشک وهۆڕ:** قریشک وهووڕ، قریشکەقریشکی زۆر.

**قریک** (باک.): خرچە.

**قڕێن:** شەڕ و دەمەقاڵە.

**قڕین:** قراندن، هاوارکردن.

**قریواندن:** قریوەکردن.

**قریوانن:** قریواندن.

**قریوە:** دەنگێکی بەرزە لەخۆشی پەیدا دەبێ.

**قریوەقریو:** قریوەی یەک لەدووای یەکتری.

**قریوەکردن:** قریواندن.

**قزە:** قزەڵقورت، قورزەڵقورت. ترسەنۆک.

**قزەڵقورت:** قزە، قورزەڵقورت.

**قزگە:** قوزگە، (موک.) شار، گەمەیێکە لە دەرەوەی جەغزی گوویزێنێدا پێ یەک دوور قوژتێکی تێدەکەن کە ناوچەی گەمەکەیە گۆی شەقێنی لێدا دەنێن و بە دار لێی دەدەن.

**قزڵجی:** مامۆستایەکی ئاینی زانا و بە ناوبانگی کورد بوە.

**قزڵـی** (بابـا.): جـوورە ترێیـەکی سـوورە، (مـوک.) گلـووی خڕێکـی درێژۆکەیە بۆ میلاق دەستەدات.

**قژ:** ـــ بوون: بۆڕ خوواردن، بەزین لەبەربەرەکانی پیلەو ئاخەفتنێدا. کەف: وەکو هەڵچوونی ماستی ترش و نیتر. لقی ووردەی درەخت یا مووی سەر. تووک، پۆڕ، موو، پۆپ، مووی ئاڵۆزی پەریشانی سەر، جووتەقانی. (ئەردە.) کەفی چت وەکو ماستی ترشاو.

**قژاک** (باک.): قەلەسابوونی، لە کۆتری گەورەترە و گۆشتی ناخورێ.

**قژاکە:** باڵندەیێکی دەنووک درێژی سەرڕەشی بەقەد کۆترەبارێکەیەکی دەبێ. قژالکە.

**قژاڵکە:** پەلەوورێکە هەمیشە خۆی گف هەڵداوە و قژی کردووە، قژاکە، باڵندەیێکی گەرمەسێرییە.

**قژە** (کە.): کزەی دڵ. ترسەنۆک، ژنانی. کەف لە هی چتی ترشاو.

**قژەسەر:** قژێکە، کە لەسەر بوویێتەوە.

**قژەکروگ:** ترشاو، ترشیاگ.

**قژەکردن:** ترشانی چت، هەڵچوونی ماست وچتی تر.

**قژبەسەر:** مەبەس لە ئافرەتە.

**قژدار:** پرچن. ـــ ی: پرچنی، پرچ هێشتنەوە.

**قژژۆک** (باک.): خەمگین، غەمگین، بەدخو.

**قژقەڵە:** قشقەڵە، قژقێرە.

**قزقز** (باک.): دەنگی کەرویشکێیە. چتێکە لێ ڕیوی و چڵی زۆر لێ بووبێتەوە.

**قزقزاوی**: قژقژ.

**قزقزە**: یەکێکە لە بەری دارە مازووان قژقژاوییە.

**قزقزۆکە**: چتی قژقژاوی.

**قزقێرە** (هەورا.): قشقەڵە.

**قزک**: پەلکی سپی و تورتی بنەوەی کەلەم. قشقەڵە، قەلەباچکە.

**قزکە**: قژقژە.

**قزکردن**: ترشان، کەفکردن و هەڵچوونی ماست وچتی تر. بۆڕدان، بەزاندن. ترشانی دۆو کەفکردنی.

**قزگ**: قەلەباچکە.

**قزگە**: قشقەڵە، قەلەباچکە، قژقژە.

**قزلان**: قەڵچۆقان.

**قزلاندن** (زا.): تواندنەوەی ڕۆن.

**قزلە**: قشلە، سەربازخانە لەناو دانشتواندا.

**قزن**: تووکن، پرچن، کەسێکە قژی بە سەرەوە بێ.

**قزنەسەرە**: سەرقژن، جندۆکە، عەجەنە، جنۆکە.

**قزنک** (باک.): جوورە ئەسپێیەکی سەگانە.

**قزۆک** (باد.): باڵندەیێکی ڕەشە دەست ودندووکی سوورە لە کۆتری گچکەترە.

**قزۆلە**: قاژرو.

**قزیاک** (زا.): قەلەڕەشە.

**قزیلاندن**: سوورکردنەوە لە ڕۆنیدا. خەفەتبارکردن.

**قزیلین**: سوورکرانەوە لە ڕۆنیدا. خەفەتباربوون.

**قزین**: خەفەتباربوون.

**قسە**: وتوویژ، گفتوگۆ. ـــ ی پڕو و پووچ و بێ واتا: هەلیت و پەڵیت.

**قسەبەر**: کەسێکە قسان بگێڕێتەوە و دووزمان بێ.

**قسە بەسەر قسەداهێنانەوە**: لە قسە لادان بۆ سەر قسەکردنێ، قسە بڕین بە یەکێک.

**قسەبردن**: گێڕانەوەی قسەی یەکێک بۆ یەکێکی تر.

**قسەبڕین**: بڕینی قسەی کەسێکی لە نێوەڕاستێدا.

**قسەبڕینەوە**: دەنگ لێک گۆڕین لەبەر زیزی و دڵشکانێ.

**قسەتاڵ**: کەسێکە قسەی ناخۆشبێ. ـــ ی: بەد وێژی، قسەناخۆشی.

**قسەجوون**: گلماندن.

**قسەجوونەوە**: دووپاتەو چەند پاتەکردنەوەی قسە.

**قسە حاڵی بوو**: تێگەیشتوو.

**قسە حاڵی بووگ**: لە قسە حاڵی بوو.

**قسەخۆش**: (باک.) دەقسڤک، کەسێکە گفتوگۆی خۆشبێ. ـــ ی: دەڤ سڤکی.

**قسەخوواردنەوە**: قووتدانەوەی قسەو دەرنەبڕینی لەبەر چتێکی دیکە.

**قسەدابڕین**: دەنگ دابڕین.

**قسەدەرهاووردن**: قسەدەرهێنان، دەرهە.

**قسەدەرهێنان**: قسەدەرهاووردن، دەرهێنانی قسەیەکی پەنهانی لە یەکێک بە فێڵ.

**قسەدروست**: کەسێکە قسەی ڕاست ودروستبێ و درۆی تێدا نەبێ. ـــ ی: قسەڕاستی.

**قسەدۆڕاندن**: دەربڕینی قسەیەکی نەهێن، شکانی قسەی یەکێک لای یەکێک.

**قسەڕاست**: ڕاست بێژ. ـــ ی: ڕاست بێژی.

**قسەڕەق**: کەسێکە قسەی قورس و ناخۆش بێ لەگەڵ خەڵکی. ـــ ی: قسە تاڵی، قسەکردنی ناخۆش.

**قسەڕەوا**: کەسێکە لەناو کۆمەڵدا قسەی بڕ بکات.

**قسەڕەوان**: یەکێکە لەدووانێدا دانەمێنێ.

**قسەڕەوایی**: دانەمانی کەسێکە لەدووانێدا.

**قسەزان**: کەسێکە شوێن و هەلی قسە بزانێ. ـــ ی: زانینی شوێن و هەلی قسانە.

**قسەزل**: کەسێکە قسەی ناقۆڵاو زل بکات. ـــ ی: قسەی ناقۆڵاو زلکردن.

**قسەسارد**: کەسێکە قسەی خۆش نەبێ. ـــ ی: قسەی ناخۆشکردن.

**قسەسەرد**: قسەسارد. ـــ ی: قسە ساردی.

**قسەشکان**: بە قسەنەکردن.

**قسەشکاندن**: بە قسەنەکردنی کەسێکی و لەژێر فەرمانی وی دەرچوون.

**قسەقوت**: قسەنەستەق.

**قسەقووتدان**: قسەخوواردن.

**قسەقووتدانەوە**: قسەخوواردنەوە.

**قسەکەر**: گفتوگۆکار.

**قسەکردن**: گفت وگۆکردن لەگەڵ یەکێکی.

**قسەگێڕانەوە**: گێڕانەوەی قسەی یەکێک بۆ یەکێکی تر.

**قسەلەڕوو**: کەسێکە قسەی هەموو کەسێک لە ڕووی هەموو کەسێکی تردا بکات یا تووڕەش بی، بێ شەرم، زڕزۆپ.

**قسەلەڕوویی**: قسەکردنی ڕەپ و ڕاست لە ڕووی خەڵکی.

**قسەلەسەرداکێشان**: قسە دەرهێنان لەیەکێک بە فێڵ.

**قسەلێکردن**: لە بابەت چتێکەوە دووان.

**قسەنەستەق**: کەسێکە قسەی خۆش وقوت بێ.

**قسەوەرگر**: گوێگر، قسە لە گوێ گر.

**قسەوەرگرتن**: لە گوێ گرتنی قسەی کەسێکی.

**قسەوەشکەر** (هەورا.): قسەچین.

**قسەوباس**: دەنگ وباس.

**قسەووتن**: ئاخۆتن.

**قسەهەڵبەست**: کەسێکە قسەی درۆ هەڵبەستێ.

**قسەهەڵبەستن**: قسەی درۆ هەڵبەستن.

**قسەهەڵچنین:** قسەپێکەوەنان.

**قسەهۆن:** هەستیار، بووێژ.

**قسەهۆنینەوە:** هەڵبەست دانان.

**قسەهێنان:** قسەی یەکێکی بۆ یەکێکی تر هێنان.

**قسەی نەستەق:** قسەی بەرزی بەکەڵک.

**قسب:** شیرەداری هەڵپاچراو.

**قسپ** (ئەردە.): وەی، قۆرت، ئاسیو، سیوەت.

**قسر** (هەورا.): نەزۆک، (شەق.، ڕەوا.) کەنەز، (زەن.) کۆنەز (کە شیری بدا)، (شکا.) ستێوور، (هەر.) ئەستەویر، بەربووارد. وولاخ یا ئاژاڵێکی مێیە کە ساڵێکی نەزابێ، نەزۆک. داری بێ بەر.

**قسرک** (باک.): چڵەکا، پووشکە. قینچکەپیوازە بۆ چەقاندنێ دەست دەدات.

**قسقە:** پیوازی فیسقەو سەلک وورد.

**قسقل:** گزگل، یەکێکە لە بەرەکانی دارەمازوو.

**قسکە** (سور.): قیبیسکە.

**قسکڵ** (ئەردە.): قسقل، گزگل، جوورێکە لە بەرەکانی دارەمازوو.

**قسڵ:** هەک، (کە.) ئەهەک، (هەورا.) ئاهەک، جاڕوو.

**قسل:** کەم، نەختێ: پارچەیێکی کەم لە چت.

**قسن:** وارشی گۆران، موغبەرە، غەڵ، خسن، شوورەی دەوری گۆڕان. کەڵە کە بەردی ناو زەوییە. (هەو.) بەش، پشک، وارە.

**قسنی:** چتێکی ڕەشباوە وەکو مێوی هەنگوینی بۆنێکی خۆشی هەیە.

**قش:** هەسسە، کسسە، بۆ ئاژۆتن و دەنگدانی مەڕان بەکاردەبرێ. ـــ لێ کردن: ئاژۆتن.

**قشپڵ** (کە.): پشقڵ، پشکەڵ.

**قشت:** جووان، لەبار، قشتیلە، لال، قشتیلانە.

**قشتێ:** نێوی ئافرەتانە.

**قشتیلانە:** خنجیلانە، قشتیلە، چتی بچکۆلانەی جووانکیلە.

**قشتیلە:** خشتیلە، خەمشۆک، ژیکەڵە، ئێسک سووک، پەت، پتکۆ، (باک.) پتۆ، نەشمیلە، قشتیلانە، جووانکیلە، چکۆڵەو جووان.

**قشقە** (بابا.): گەزۆیەکە لەهەواوە دەنیشێتە سەر جەوتی دارە بەڕووی جەوتەکەی لێدەکەنەوە و لەسەر قاپێکی دادەنرێت تا تەواو دەچۆڕێتەوە ڕەنگی سپیەو هیچ کولاندنی پێناوێ. ڕەنگێکیشە لە هی وولاخانی بەرزە.

**قشقەرە** (هەورا.): قشقەڵە، قەلەباچکە.

**قشقەڵە:** کشکلینگ، قژقیرە، کەشکەڵە، قژقەڵە، (هەو.، کۆ.) قەلەباچکە، قەجەلە، قاژەک، قیژقەڵە، (هەورا.) قشقیرە، (دەر.، زەن.) قەلەپازەڵە، (دەر.) قەلەباشکە، قەلەبەڵەک، (خۆ.) قەلەبەڵەکە، قشقارە، (ئەردە.) قشقەرە.

**قشقژە** (کە.): تێکچڕژان.

**قشقیرە** (هەورا.): قشقەڵە.

**قشکە:** جوورێکە لەبەری دارەمازوو قژقژاوییە.

**قشلاخ** (کە.): زستانەوار، هەوارگەی زستانییە، چەند ماڵێکە لەدێ جیا بووینەوە بۆ بەخێو کردنی ئاژاڵ و کشت وکاڵ کردن.

**قشلاخ** (دەر.): شووێنی کۆنەدێ، دێیەکە کاوول بووبێ.

**قشلاق:** قشلاخ.

**قشڵە:** دیوان، سەراچە، سەرا، جێگای دەستە پێشمەرگەیێکییە.

**قغ:** قغەقغ، قرەقری قەلە ڕەشە.

**قفە** (جا.): بەلەم و لۆتکەی گچکە. (جا.) کۆکە، کۆخە، قۆزە.

**قفڵ:** ئاسنێکە دووای ئالقەرێزکردن لەدوولای دەرکە دەدرێت یا هی سندووقی بۆ قاپی و بە کلیل دەکرێتەوە. قڵف، کۆد، کۆدک، کلۆم، کلۆمی ئاسن، (هەورا.) فەراشە، قولفی ئاسن.

**قفڵدان:** داخستنی دەرگا و سندورق بە قفل.

**قفین:** کۆکین.

**قفەک** (باد.): پڕ بەدەستی، پڕ بەچەنگی.

**ققە:** قەقە، کەکە، گکە، لە زاراوەی منداڵاندا بە چتی شیرین دەڵێن.

**قل** (هەو.، بابا.، خۆ.، دەر.): دان، دەنک، گلوو، دەنکی دانەوێڵە، گلووەترێ. دانە، ـــ ێک ترێ: گلووێک ترێ.

**قلاخ:** قەلاخ.

**قلاش** (کە.): تێکولێی دار. پارچەی زەنگەداری وورد.

**قلاشتن:** قەلاشتن.

**قلاشکەری:** قەلاشکەری.

**قلاف** (فە.): کالان.

**قلاق** (لو.): قەلەڕەشە.

**قڵەشان:** قەڵەشان، قڵیشان، بۆ داروئیتر.

**قڵە:** کەشی ئاوری پشکۆ کە خاڵی ڕەشی تێدا دەمێنێ. ئاورەکە ـــ ی دێ.

**قڵەشاندن:** قەڵەشاندن.

**قڵەشاو:** قەڵەشاو.

**قلەقل:** قلەی ئاوور بەرزۆری.

**قلەوە** (فە.): دەرزیلە.

**قڵپ:** وەرگەڕان، سەرەو نخوون بوون، سەرەوژێر بوونی چتێکی ئاو یا شیر ویا هەر جوورە شلەمەنیەکی تێدابێ و سەری ئاوەڵەبێ. ـــ بوونەوە: ڕژان، دەمەونخوون بوونەوە. هەنگڵی دیزەو گۆزەو ئیترە، (هەورا.) قوڵپ.

**قڵپاندنەوە:** قڵپ کردنەوە.

**قڵپە:** قڵپەی ئاوێ، دەنگی ڕشانەوەی مرۆو ڕژانی ئاوییە. دەنگی ڕژانی چت بەرزۆری. ـــ قڵپ: دەنگی یەک لەدووای یەکتری ڕژان. (دەر.) قوڵپەقوڵپ، (فە.) گلەگلە، دەنگەدەنگی ئاوییە لەکاتی ڕژان یا ڕژاندنیدا.

**قڵپەوبوون:** قڵپ بوونەوە.

**قڵپ بوونەوە:** قوڵپین، گۆزەو دەفری تر، بەسەرە و ژێربوونی ئاوەکەی لێ بڕژێ.

**قڵپ کردنەوە:** قوڵپاندن، قڵپاندنەوە، ڕژاندن، دەمەونخوونکردنەوە.

**قلّپ و قوّپ** (کە.): بە گرمەگرمی گوللەو توّپیان دەلّێن. دەنگی هێلّنجە لەکاتی ڕشانەوەدا.

**قلّپ وهوّڕ:** قلّپەقلّپی زوّر.

**قلّت** (ئەردە.): قولّت، قولتە، جوّش، قلّتە، قولّ، کولّ.

**قلّتە:** قلّت، قولّ، کولّ، جوّش، قولّتە. ــ قلّت: قولّتەقولّت.

**قلّتیان** (ئەردە.): قولّدان، جوّشیان، وەقولّتەقولّت کەوتن.

**قلّچخ:** چووکلّ و چیوی و قونچکی مێووژییە. قالّچخ، قلّچخ، چکل، چقلّ، قەلّچخ. داسوو.

**قلّچغ:** قلّچخ: قونچکی مێوژی. قالّچغ، قەلچغ، چقلّ. داسوو.

**قلّخ** (زا.): برنگ.

**قلّخاندن:** کوّخاندن.

**قلّخە:** کوّخە، کوّکە. ــ قلّخ: کوّخەکوّخ.

**قلّخن:** کەسێکە زوّر بکوّخیّ.

**قلّخین:** کوّخین.

**قلّغ** (ئەردە.): ڕێخست و سروشت.

**قلّف** (هەورا.): قفل، (قفل) ی ئارەوان لە قلّف وەرگیراوە کوردییە چونکوو ڕەگ و ڕیشەی لەزمانی ئێمەدا زوّرترە وەکوو: ــ ی گوّزە لە ــ ی دیزەو گوّزەو کووپەو مەسێنەو لوولێنەو ئیتر، قولّفی گوریس و دوّخین و ئیتر. هەنگلّی دیزەو گوّزەو ئیتر، ئالّقەیەکیشە لە بەن و گوریس و ئیتر دروستدەکریّ.

**قلقزاک** (باک.): بالّندەیێکە.

**قلقل** (لو.): بەری گیایەکە لە نیسک دەچیّ، بە برێشکەیی دەخوریّ.

**قلقلە:** زەنگولّەی خڕەو چەند پارچەی ئاسنی چکوّلەو گرموّلەی تێدایە.

**قلکەجەوت:** کلاّوە بەرو.

**قلّم بوونەوە:** قلّپ بوونەوە.

**قلّمە** (ئەردە.): قلّپە.

**قلّم:** قلّپ، ، سەروژێر.

**قلّمەبوون** (ئەردە.): قلّپ بوونەوە، ڕژیان.

**قلّمەدان** (ئەردە.): قلّپ کردنەوە، ڕژاندن.

**قلنج** (ئەردە.): بنەهەنگلّ.

**قلوّپ** (باک.): شەل.

**قلوّج** (باک.): شاخ، قوّچ.

**قلوّچک:** خێل، کەسێک چاوێکی وەک چاوەکەی تر نەبیّ.

**قلوّر:** کلوّر، بوّش، ناو بەتالّ وەکوو قامیش.

**قلوّنچک** (باک.): گیایەکە.

**قل وبل:** قت وفت، باری خورانی لەش. دەغدەغە، کەوتنەسەر هەموسی چتێکی.

**قلووج** (باک.): شاخ، قوّچ.

**قلووس** (باک.): کووڕ.

**قلیّ بلیّ:** قلی بلی، تێکەلاّو، شێواو.

**قلێتە** (دەر.): قەلاّدەی سەگانە.

**قلێچر:** گیایەکی بەهاری گەلاّووردە گولّێکی زەرد دێنیّ.

**قلێر** (باک.): پیسی، چلّک، قرێژ.

**قلێژنگی:** جوورە چێشتێکە لە برنج و هەلّووژە دروستدەکریّ.

**قلێل** (زا.): بەکونی هەموو چتێک دەلّێن.

**قلێنچەک** (ئەردە.): برای تووتەلّە.

**قلێنچک** (ئەردە.): کلێنچکە، کلکی بزن، باریکایی سەردووک. تلّێنچکە.

**قلێنچکەی پەلەمور:** قلینچک.

**قلێوی** (باک.): کەسێکە خوّی لە ئاویدا قووم بکات.

**قلی:** گیایەکە بالاّبەرز دەسووتێنرێت لە خوّلەمێشەکەی تێزاب ئەگیرێت، سابوونی پیّ دروستدەکریّ. (هەو.، شەق.) گلووە تریّ، دانە، دەنک.

**قلیان** (هەورا.): قەلیان، قەننە، سەبیلە.

**قلیاناوی** (هەورا.): نێرگەلە، قەلیاناو. قەننەی ئاویّ.

**قلیانخوّر:** کەسێکە قەلیان بکێشیّ. ــ ی: قەلیانکێشان.

**قلیاندار:** کەسێکە هەر قەلیانی بوّ یەکێکی تر تێ بکات. ــ ی: قەلیان تێکردن بوّ یەکێکی تر.

**قلیاندەیی:** قەنە، قەننە.

**قلیانکێش:** قەلیانکێش. ــ ی: قەلیانکێشی.

**قلیو** (ئەردە.): ناوی زاخی ڕەشە کە بوّ ڕەشکردنی پێستی دەباغکراو بەکاردێنریّ.

**قلّیە:** قلیە، گیایەکی تیژە سابوونی پێدەکریّ: قلێژەنگی.

**قلیە** (باک.، باد.): قامکە چووکەلّە، تیتەلە، تووتەلّە.

**قلیچ:** شیر، شمشیر، قەدارە، قەیارە.

**قلیچک، قلیچکە** (هەورا.): کلک، قلیچەک. قامکە تووتەلّە، قامکە چکوّلّە.

**قلیچکەهوّرتەکنیّ:** کلک هەلّتەکێنە.

**قلیمک** (هەو.): میسکە پیواز (بوّچاندن).

**قلیش** (کە.): قەلّەش، قەلّەشت، تلّیش، درزبردنی میوەو چتی تر.

**قلیشان** (هەورا.): قەلّشین، قەلّەشان، درزبردنی چت.

**قلّیشانەوە:** دەم دانەوە، درز تیّ بوون.

**قلّیشاندن:** تلّیشاندن، قەلّەشاندن، لەتکردنی دارو چتی تر بە تیغ.

**قلّیشاندنەوە:** قەلّەشاندنەوە بە تیغ.

**قلّیشاو:** تلّیشاو، قەلّەشاو، چتێکە، کە قلّیشی تیّ بوویّ.

**قلّیشیای** (هەورا.): ترەکیایی، ترەکین، قەلّشتن، قەلّشان، قەلّەشاندن.

**قلیف** (ئەردە.): شکوّفەی قوّزاخەی پەمموو. (ئەردە.)کالان، کێلانی شیر و خەنجەرو هەرچی بیّ. ــ شکوّفە: کاسە، قوّزاخە.

**قلیک** (زا.): داخستنی شمشێرەی دەرگا.

**قلینج:** قامکەچکوّلّە، تووتە.

**قلینجگرە** (بلّ.، ئاک.): قامکەتووتەلّە.

**قلینچک:** قلینج، کلێنچک.

**قلینچکە:** قلینچک.

**قلیوبلی:** چتی پڕووپووچ و بێ واتا، قسە یا نووسینی بێ واتا، شڕم بڕم.

**قم:** قوم.

**قمار:** قومار.

**قمارباز:** قومارباز. ـــ ی: قوماربازی.

**قمبلو:** بە زۆری کشانی ئاوە بەسەر کشت وکاڵاندا.

**قمقمۆک:** خەمەگرو، داعبایەکە وەکوو شینشینکی وایە سەری خڕە لەشیشی پنک پنک و شین و بۆرە. (هەورا.) قومقومە. قومقومۆکە.

**قمقمۆکە:** قومقومۆکە.

**قملاخ:** خمخۆرکی زەوی.

**قمۆش:** دوارۆژ، پاشەرۆژ. دەست وپێوەند.

**قمیش:** قومووش.

**قن:** لیس، هێلانە، کولانەمریشک، کۆلیت.

**قنانەوە** (گەر.): سستی، لەسەر چوون، داقنینەوە، (هەورا.) فەتووت بیەن.

**قنە:** هاندان بۆ گیان لەبەران، نکە.

**قنەقن:** جوورە ڕەوتێکی کەوانە، چەشن و شێوەی ڕۆیشتنی کەوە. مرۆ کە بە شادی و خۆشی بنوێنێ. نقەنق، نکەنک، هانکەهانک، دەنگی مرۆی نەخۆشە یا ماندوو.

**قنج:** باش، ڕاست، قیت. ڕەپ، بەل، قووت. جووان، لاوچاک.

**قنج دانیشتن:** قیت دانیشتن.

**قنجان:** قرنجان.

**قنجاندن:** قرنجاندن.

**قنجەقنج:** قوتەقوت. ـــ کردن: قوتەقوتکردن.

**قنجەی پا** (شورا.): پانیە، پاژنەی پێ.

**قنج بوونەوە:** قوت بوونەوە.

**قنجک:** سەرو قوونی بامیەو میوەو چتی ترە، قونچک.

**قنجکردنەوە:** قوتکردنەوە.

**قنجیلانە:** خشتیلانە.

**قنجیلە:** قجیلە، پێقەلە، جووان.

**قنج** (هەورا.): قووچکەو بڵندایی سەردیواران و گردو تەپۆڵکەو چیایان ویا لە هەر جێگایەکی تربێت.

**قنچک:** قونچکی مێوژ و پیوازو نیدیکەیە، ـــ بامیەو نیتر. تووتک، سەگێکی چکۆڵەیە. کلێنچکە. دومەڵ، زیپکە. پارچەیەک، تۆزێک، کەمێک.

**قنچکان** (ئەردە.): چیچکان، چینچکان.

**قنچکاو:** زنچکاو، ئاوێکە لە زیپکەو قوونیژان دێت.

**قنچکە:** بروانە: قینچکە، زیپکە.

**قیچکەسلاوە** (هەورا.): باپشکێو، (دزە.) سیسکەسلاوە، سیچکەسلاوە.

**قنچکەکردن:** دانیشتن بە چیچکانەوە.

**قندر:** قیت، ڕاست. ـــ بوونەوە: ڕاست بوونەوە، قیت بوونەوە.

**قنک** (باک.): کولانەی مریشکێ.

**قنگ** (کە.): قوون، کۆم، سیک، پیزی، کۆمی، برێژە، بێخ.

**قنگانیسک** (ئەردە.): ئانیشک.

**قنگاو:** ئاوێکە نرابێ لە مەرەزە و کشت وکاڵ سەری کردبێت و دەرچووبێت.

**قنگاوڵە:** دوورپەلە، گیایەکی بەهارییە سووردەکرێتەوە بۆ ڕەوانی دەخورێت، کەمێک بەرز دەبێتەوە گەڵاشی وەهی بی دەچێ.

**قنگەبان:** بانی خانوو کە لە پشتەوە زۆر لە زەوی نزم بێ.

**قنگەجگەرە:** قونچکەجگەرە.

**قنگەجنۆکە:** مەبەس لە شووێنی زۆر تەسک و تروسک و تەنگەبەرە.

**قنگەجووری:** قوون قووچاندنی گیاندار بەهۆی زۆر گوو هاتنی یا هێلکە کردنیەوە.

**قنگەخەو:** وەنەوزە، نوستن بەقوونەوە.

**قنگەخشکێ:** قوونە خشکێ، لەسەر قوون خۆ خشاندن.

**قنگەخشکی:** خزین لەبەرزییەوە بۆ خوواری.

**قنگەخلیسکێ:** لەسەر قوون هاتنەخووارەوە، لە شووێنی لێژەوە سا ووشک بێ یا بەفری لێ بێ.

**قنگەخورووکە:** نەخۆشیەکە لە هەندێ گیانداراندا قوونی دێتە خورروو، خارشت.

**قنگەدڕک:** درووی کەنگرییە لەکاتی نێربوونیدا دەبڕێت دەکرێتە گزرە بۆ وولاخان، قانگەلاشک.

**قنگەر** (کە.): قووندەر. ـــ ی (هەورا.): کەنگر.

**قنگەزە:** پشت، نەژاد، دارا لە ـــ ی بابانە واتە لەو ڕەگەزەیە.

**قنگەسووتەکە:** دەردێکە تووشی منداڵی ساوا و مەرەزەی کۆرپە دەبێ.

**قنگەسووتەکێ:** قنگەسووتەکە.

**قنگەشەڕ:** شەڕکردن لەگەڵ پێدزکێدا پاشەوپاش.

**قنگەقنگ:** برێتییە لە دوواخستنی کار بۆ نەکردنی، برزۆ لەم کارەدا ـــ دەکا.

**قنگەگاز** (شا.): برینێکە لەسەرەوەی نێسکی سمتی گیان لەبەران دێت کە شوونەکە نێکی پێدەڵێن، لە کوڵوکی وولاخیش پەیدا دەبێ بەهۆی گرتنی زین یا کورتان ویا بارەوە.

**قنگەلاشک** (باک.): قانگەلاشک.

**قنگەلێس:** قووندانەوەیەکی کەم لەسەر چیچکان.

**قنگەلەفس:** قنگەلێس.

**قنگەنشینە:** قنگەنشینکە.

**قنگەنشینکە:** منداڵێکە تازە فێرە دانیشتن بووبێ لەسەر قوون.

**قنگەوتلوور:** قوونەوتلوور، تل، خل، خولۆر، خللۆر، تلۆر، پاڵکەوتن بە جورێ، کە قنگ دەربەڕێ. ـــ بوونەوە. ـــ کردنەوە.

**قنگچاو:** قنگی چاو، قولینچکی چاو بەلای گەرووەوە.

**قنگچاوپێدان** (ئەردە.): بە گۆشەی چاو ڕووانین.

**قنگ خولدان:** قوون هەڵسووڕاندن، سەماکردن، قەلبیرە، قردان، قنگ هەڵتەکاندن.

**قنگدانەوە:** مەبەس لە کەمە دانیشتنێکە.

**قنگدانەزەوی:** جنچکان، قنچکە، قنیچکان، هەڵتروشکان.

**قنگدەر:** قووندەر، نێرینەی حیز.

**قنگر** (کە.): کەنگر، گیایەکی بەهارییە و بنەکەی دەخورێ.

**قنگرەزا** (ئەردە.): جوورە جەوییەکە لە کەنگر پەیدا دەبێ.

**قنگرپاچ:** پنچی کەنگر، بنجی کەنگر.

**قنگرتن:** مەبەس لەمنداڵێ کە بۆ یەکەم جار لەسەر قوون دانیشێ.

**قنگرواچ:** قنگرپاچ.

**قنگروماس:** کەنگروماست.

**قنگلاشک:** نێرتکی وشکی گیای کەنگرییە.

**قنگ لێ کەوتوو:** مەبەس لە مەردومی بێهۆش وگۆش کە هەمیشە چتی لێ بکەوێ.

**قنگ هەڵتەکاندن:** قنگ خولدان.

**قنگ هەڵتەنن:** قوون هەڵتەکاندن.

**قنگهەڵتەکێنە:** قنگ هەڵسەنگێنە، بەرگاییلکە، کلک هەڵتەکێنە، کلک هەڵسەنگێنە، فیسقە.

**قنۆرک** (کە.): منداڵی ساوا.

**قنیات** (دزە.): ژیان. ــ ی لێ بڕی: ژیانی لێ بڕی. (خۆ.) گیانەڵڵا، سەرەمەرگ. نەوس کوژی، سازگاری. ــ کردن: داکەوتن بە بەشی کەم، نەوس کوژتن، سازگاری.

**قوبا** (زا.): ماستی بزرکاو.

**قۆبەهەدەر** (باک.): گیایەکە.

**قوبکە** (ئەردە.): گومبەز، لووتکەی چیای.

**قۆپ** (باک.): قوللەی کێوان. (زا.) کەسێکە دەستی یا پێی شلەپەتەبێ. (شوا.) گووێزنگ.

**قۆپان:** قوپان.

**قۆپاندن:** قوپاندن.

**قۆپاندنەوە:** قوپاندنەوە.

**قۆپەن** (هەو.، موک.): ئەو کۆما قیت و پرانەن کە لەنێو دەغلاّندا بەقەد ئامێزێکی بڵند و شین دەبن هۆی ئەوە کە جێگایان یا زبڵە ویا کونی داعبایانە.

**قۆپەن** (موک.، کر.): لاسکی گیایانە.

**قۆپچە:** درگمە. جوورێکیشە لەبەری دارەمازوو.

**قۆپز:** هاشەر هووشە.

**قۆپک** (باد.): قرخێنە. (باک.) بەروو، گرێ.

**قۆپکە:** لووتکەی چیای.

**قۆپی:** قۆپییە.

**قۆپییە:** قۆپی، شوێنێکە نەرم ویا قووڵ و زنەک و پڕ لەدارو بار یا گژو گیابێ. (هەو.) تەڕازن، (دەر.) ئاوزا، زۆنک (زۆنگی ئاودار)، (هەورا.) کەناو، ئاوگیر، لیتە، زەلکاو، زنە، زنەک، بە شوێنێ فینکیش دەڵێن.

**قۆت:** کۆت، ڕووت وقووت.

**قۆتازە** (کە.): قۆتاسە.

**قۆتاسە:** جوورە خشڵێکی ژنانەیە وەکوو زەنگوڵە وایە لە زێڕ و زیو دروستدەکرێ و لە پرچ (کەزی) دەخرێ، گوڵنگەی کەزیانە جا لە زێڕ یا لە زیو بێت: قۆیتاسە.

**قۆتان:** هەرزاڵ.

**قوتەرە** (ڕەوا.): قۆرتەرە، تەندوورەی ئاشییە، دۆر، قووتەرە، کۆتەرە. ــ ی ئاشی: زاری دۆلاشی.

**قۆتەرە** (هەورا.): ئاشی کوتەک. خۆترە.

**قۆتەڵە** (گەر.): دۆلاش.

**قۆتر** (هەر.، کە.): مەڕۆ یا وولاخێک ویان ئاژاڵێکە پیر و داکەوتوو و گێژ بووبێ. ــ ی (هەر.، کە.): داکەوتن و گێژبوونی مەڕۆ و وولاخ و ئاژاڵی پیرە.

**قوتک:** کورتەک، مرادخانی.

**قۆتی** (باک.): قوتوو، قۆدی.

**قۆتیلە:** قۆتی بچووک، قوتووی نەوتی چرا.

**قۆتین:** سەری ڕووت، دارا سەری ــ ە.

**قۆجە** (ئەردە.): جاوین.

**قۆچ** (سۆ.، کە.): شاخی وولاخ و ئاژاڵانە. پێشبڕکەر پرتاوی دوو سوارانە بۆ ئەوەی یەکتری بەجێ بێڵن: دارا و بارام ــ دەکەن کە دڕندە و نێچیری بگرن. (نەهە.، باک.) شاخی وولاخ و ئاژاڵیەر بە قیتکایی چیایان و هەموو بەرزاییکی دەڵێن. (باک.) بنە دارێکی بڕاوە کە بەرەگ و ڕیشەوە لە زەویدا مابێتەوە. قوربانی، گۆشت. ــ ی قوربانی: گۆشتی قوربانی. (ڕەوا.) ئاقە کەزییەکە لە پێشەسەری. بەران، تیگڵ.

**قۆچاخ:** توند وتۆڵ و ئازاو وووریا، خێرا، زرنگ.

**قۆچان:** کۆدە، قاقانی، خاقانی، قەباڵە، پەسوولە. بزنانە، جوورە باجێکە لە خاوەنی ئاژاڵ دەستێنرێت لە ساڵدا. (کە.) شەڕەشاخ.

**قۆچەقانی:** (دەر.) قەلماسک، قەڵماسک، هەفچار، (هەو.، باد.) بەردەقانی، کوچکانی، سەپان، کانک، کانیک، کەهنیک، کەڤرکانی، کەڤکانۆک، (باک.) کەهنی. (هەورا.، جا.) بەرزەقانی، جەرکانی، تەفکانی، (باک.) کەفک، بەردەقانی.

**قۆچدار:** شاخدار.

**قۆچدان:** قۆچ وەشاندن.

**قۆچسبە** (هەورا.، زا.): گیایەکە بنکێکی ڕەوانی هەیە.

**قۆچ تێهەڵدان:** شۆق تێهەڵدان.

**قۆچەوان:** پۆشەکەر، شەڕەقۆچکەر.

**قۆچقۆچانێ:** شەڕەشاخ. (هەو.) بزن بزنانێ، قۆچ لێدانێ. گەمەیەکە منداڵان بەسەری لێکدەدەن.

**قۆچقە:** کۆچکە، جوورە کڵاوێکە لەسەری منداڵان دەنرێت.

**قۆچک:** کۆچکەی ژن و منداڵان.

**قۆچکه** (هەورا. ، باک. ) : کۆچکه، قوڵەقۆچکه، جوورەکڵاوێکی کلکداره منداڵ و ئافرەتانی دێهاتەکانی موکریان لەسەریان دەکرد، بە دەسماڵی سەری ژنانیش دەڵێن. (ئەردە. ) گووێ، گووێچکه. سۆرانی، ئەنگوچک.

**قۆچکەتاش:** قۆچی تاش.

**قۆچکەسۆرانی** (ئەردە. ) : فەقێیانه، ئەنگوچک، سۆرانی.

**قۆچکی** (باک. ) : ژووری میوانداری.

**قۆچ لێدانێ:** قۆچقۆچانێ.

**قۆچ وەشاندن:** شۆق وەشاندن.

**قۆچ وەشێن:** شۆق وەشێن.

**قۆچهاوێژتن:** شۆق هاوێژتن.

**قۆچیتاش:** ئەو کەسەیە مووی پێشی ناوچاوانی ئەم وئەو بۆ جووانی بتراشێ. ــ ی: تاشرانی مووی پێشی ناوچاوان بۆ جووانی.

**قۆخ** (بابا. ، کە. ) : کێڵ، کۆخ، زنج، قۆخ، خانووی نێوباخ و باخچانە بۆ باخەوان. قوڕ. چتی چەماوەوە، کووڕ، قاخ، چەمیاگ. (بابا. ) خۆخ، هەشتاڵوو مزرو تووکن و سپی پاتە لە قەیسی گەورەتره. (ئەردە. ) زیخ.

**قۆخە:** کۆخە، قفە، قۆزە، کۆکە. ــ قۆخ: کۆکەکۆک. (ئەردە. ) قاخەقاخ، چەمان چەمان، بە کووڕبوون و چەمانەوە.

**قۆخەڵ** (دەر. ) : خانووی گچکە، قۆکەل.

**قۆختە** (شار. ) : حەشارگە، شاردنگە. کۆمە زنجی چکۆڵە.

**قۆخدان** (ئەردە. ) : چەمانەوە، قاخدان.

**قۆخڵ** (بابا. ) : ئاودێر، کووخ، زنج، قۆختە.

**قۆدک** (زا. ، دهۆ. ) : (هەورا. ) ئاوێنه، جام.

**قۆدی:** قوتوو.

**قۆدیه** (خۆ. ) : قوتووی ئاوێنه، ئاوێنه.

**قۆدیله** (کۆ. ) : کۆجیله، قوتیله. (خۆ. ) ئاوێنەی گچکە.

**قۆڕ** (باک. ) : گونک. (باک. ) خەت، دێر، ڕێز. ــ کردن: پێهەڵگوتن، هەڵنان. زەنگی گەورەی ملی پێشەنگ. بێ واتا، پووچ، خراو. وەتەبا، (کۆ. ، کە. ، هەورا. ) دەبە، (زەن. ) دەبەگون، گونک، گونزل، گونده، (هەورا. ) قێرە، گوندڕاو، (زا. ) ڕتلۆ. ووتەی ــ : قۆخ. ــ ی ئاژاڵ و وڵاخان: گەدەپیست. کەس یا زیندەماڵێکە ڕیخۆڵەی ڕژابێتە ناوگونیەوە. زەنگە بەڵان بەتەنێ بەکارنابرێ دەڵێن زەنگ وقۆڕ. (زا. ) گیانداری لاواز. چتی هیچ وپووچ.

**قوڕاچکه:** قوڕقوڕاچکه.

**قۆڕاخ** (زرا. ، جا. ، هەورا. ) جەمام، کەسێکە کەم گەڕابێ و لە گەڕانێدا زوو ماندووبێ. (جا. ) قەیاسه، کەژوو.

**قۆڕان:** چک بوون، بنەبڕانی ئاو لەهاویناندا، تنۆکێکی نەمان.

**قۆڕاندن:** بۆڕاندن.

**قۆره:** (بابا. ) پەرسیله، (هەو. ) پەسیله، (دەر. ) پەسیره، (هەورا. ) هاڵه، هاڵێ، بەرسیله، (باک. ) بێ سیره. ــ ی ووشک: سرمۆکه، سرەمۆک.

**قۆڕه:** قۆڕەی زگه، دەنگی زگ، جووره دەنگێکیشە وەک دەنگی قۆڕقۆڕه، دەردێکی کوژندەی وڵاخانه. بۆڕەی گاومانگا، قووڕەی سەگییه. لووره، دەنگی ڕێوی و ئیتر. میاومیاوی پشیله.

**قۆڕەقۆڕ:** جۆڕەجۆڕ، بۆڕەبۆڕی گاومانگا، قۆڕەی یەک لەدووای یەکتری. (دەر. ) دەنگی قۆڕقۆڕەیە دەنگێکە تووشی ڕەشەوڵاخی دەبێ.

**قۆڕەولەمی** (هەورا. ) : قۆڕەی زگ.

**قۆرت:** تەگەره، کۆسپه، کڵۆڵی، دڵۆ، ئەگەر، پەڵپ، نەگبەتی، تەنگانه، تەنگی، ئاسیو، تەوەره، گرێ. ــ تێخستن: تەگەره تێخستن، کەند، قووڵکه، چاڵ، کەنداڵ. (ئەردە. ) قوم، چۆڕ.

**قۆرته** (موک. ) : (هەو. ) ڕەوان، جووره غارێکی وڵاخانه، لۆقەلۆق.

**قۆرتەره:** تەندوور.

**قۆرتەقۆرت:** لۆقەلۆق.

**قۆرتقۆرتانێ:** جووره گەمەیێکی منداڵانەیه.

**قۆرتقۆرتاوی:** چتی لق لق.

**قۆرتم:** قورتم.

**قۆرتی** (باد. ) : گۆتره.

**قورچ** (باد. ) : تیکوڵە سەوزەکەی فەریکە گووێزییه.

**قۆرچین:** هەڵپچڕکاندنی گیا.

**قۆرخ:** یاساخ، پاوان، قەدەغە. (کە. ) یارییەکە: یەکێک دەنوێ هاوڕێیەکانی دەستی لەسەر پشتی دادەنێن بە کۆمەڵە لێی دەدەن تا هەڵی دێنێ کە دەستی کێ لەسەرەوەیه.

**قۆرخانه:** چەکخانه، جبەخانه.

**قۆردوون:** ئەو زریزەیە، کە لە کاتژمێر دەخرێ ولە ئێخەی مرۆڤان قاییم دەکرێ.

**قۆرغ:** قەدەغەکردنی زەوی لە بڕینی دارو درەخت وگیا. قەدەغەکردنی گەرماو بە تەواوی بۆ یەکێک یا خێزانێکی. ــ کردن: تەرخانکردنی گەرماوە بە تێکڕایی بۆ یەکێک یا بۆ خێزانێک.

**قۆڕقۆڕه:** جووره مەرزەقێکە کونێکی لە تەنیشتیەتی، کە داکوترێ قۆڕەی لێوەدێت.

**قۆڕقێنه:** قرقێنه.

**قورک** (زا. ) : پشت مل.

**قۆرگ** (زا. ) : کلێنچکەی مەردوم.

**قۆڕن** (ئەردە. ) : تاوان، گوناح.

**قۆرواق** (هەورا. ) : بۆق.

**قۆری:** چادان، چایدان، قۆریه.

**قۆڕی:** (سەر. ، موک. ، بابا. ، کە. ، ڕۆژ. ، شەدەڵێ) گێرنگرک، بزن مژه، قومقومه، قومقومۆکه، دوڕڵقەدەره، لەو داعبا مارخۆرانەیه، کە لەگەڵ ماری شەڕێ دەکەن. قۆڕبوونی مرۆڤ.

**قۆری:** چادان، کادانێکە لە تەنیشت ماڵانەوە بەگردی لە تەیان دروست دەکرێ و نێوەکەی پڕ لە کادەکەن، سەرەکەشی بە قوڕقزی سوواغدەدەن. لۆدەی گزرەگیا.

**قۆریانه:** سووسەمار.

**قۆریانەزەردە** (ئەردە.): بزن مژ، بزن مژک.

**قۆریە** (کۆ.): گیشەگیایەکی نێو پڕ لە کا ئاخنراوە، زنجەگیا، ناوی گەڕەکێکیشە لەشاری کەرکوک.

**قۆریتان**: ووشەیێکی سووکە بە جنێو بە ئافرەت دەکوترێت.

**قۆریجان**: قۆرنجان.

**قۆریژە**: بۆق، بەق. داعبایەکە شەوانە لەناو شینایی و لە قەراغ ئاو و جۆگەو ڕووباراندا دەقیرێنێ.

**قۆرین**: دەنگی باڵندەیەکییە.

**قۆرینگە** (هەو.): کۆنگرە، قۆنگرە.

**قۆز**: کوور، چەماوەوە. جوان، لاوچاک، شەنگ، شۆخ، هەڵکەوتوو، نایاب.

**قۆزاخە**: ـــ ی لۆکە: کەلووی پەمۆ، گوڵی بەری پەمۆ. ـــ ی پەمۆ: گاڵ، گۆزک، کەلوو، تۆربەو تێکوڵی پەمۆیە. ـــ ی ئاوریشم: چتێکی گردە کرمی ئاوریشم هەڵیدەپێچێ. قۆزلاخە، کاسە، خلێف.

**قۆزای** (هەورا.): کۆخین.

**قۆزیی**: جوانی، شەنگ و شۆخی. (ئەردە.) قۆقزی، بڵندایی.

**قۆزە** (جا.، هەورا.): کۆخە، قفە، کۆکە، قۆخە.

**قۆزەبەرد**: گڵۆوەرز، گڵۆوز، قەوزە، قەوزە بەرد.

**قۆزەڕەشە**: کۆخەڕەشە.

**قۆزەسیاوە**: کۆخەڕەشە.

**قۆزەقوڕواق** (ئەردە.): قەوزە.

**قۆزەقۆز**: کۆخەکۆخە.

**قۆزتنەوە**: لە حەواوە گرتنەوەی تۆپ و چتی تر بەدەست و بردی.

**قۆزەوە**: چتێکە وەکوو تۆپ و چتی تر لە حەواوە بگیرێتەوە.

**قۆزلاخ** (ئەردە.): قۆزاخە.

**قۆزلاخە** (ئەردە.): قۆزاخە.

**قۆزلاخەی گەنم** (ئەردە.): کیفی گوڵەگەنمی.

**قۆزلاخەی لۆکە** (ئەردە.): قۆزاخەی لۆکە.

**قۆزلاخەی هەوریشم**: قۆزاخەی ئاوریشم.

**قۆزلەمینە**: چێشتی چەنسوتەکە.

**قۆزێتی**: جوانی، شەنگی.

**قۆزێنی**: جوانی، شەنگی، قۆزێتی.

**قۆزی**: جوانی، شەنگی، شۆخی. (باک.) گۆشە.

**قۆزی چاف** (باد.): قولینچکی چاو.

**قۆزین**: کۆخین، کۆکین.

**قۆزیانە**: سووسەمار.

**قۆستنەوە**: قۆزتنەوە.

**قۆشە**: دراوێکی کەم نرخی ئێرانییە، کێژخوواردنی مووی نێوچاوانی ئەسپ و ماین، جا گۆیا، کە ئەو مووە لەیەک لاوە بوو باشە و ئەگەر لە دوو لاوە بوو شوومە پێی دەڵێن: (ئەردە.) جووت قۆشە. شووم، بەدرودم، مەیشووم. نیشانە، ئامانج.

**قۆشەن** (ئەردە.): کۆمەڵە پیاوێک کە پیادە یا سووار ویا تێکەڵاو و چەکدارین، لەشکر، سپا، سوپا، ئۆردوو.

**قۆشەنیان**: لنگدانی وولاخ: ئەم شوێنە مەیدانی قۆشەنیانە.

**قۆشمە** (کە.، هەو.): گاڵتەچی، هارو هاج و بێ ئابڕوو. (کە.، هەو.) غاردان و ڕمبازییە.

**قۆفڵ** (ئەردە.): قفڵ.

قۆفڵ

**قۆف** (باک.): چەماوەوە، خووار، کوور.

**قۆق** (زا.): یەکسەمە لە ئاژاڵ.

**قۆقز** (کە.): زەق، دەربەرپو، بڵند، قیت. ـــ ایی: زەقی، دەربەرپوی، قۆزایی، قیتایی، قوتایی، بڵندایی. ـــ ی: قۆقزایی.

**قۆقک** (باک.): قوولکە، کون. ـــ ا چاف: قوڵکەی چاو.

**قۆقن** (فە.): کوور، کۆم.

**قۆقلاندن** (باک.): کونکردن.

**قۆقلین**: کون بوون، کونکران.

**قۆکەل** (باک.): خانووی گچکەیە لە بەردی ووشک، قۆخەل.

**قۆڵ** (باک.): جووره عەرەبانەیێکی بێ پێچکە چتی قورسی پێدەکێشن. تیرە، جووم، دەستەیێک لە مەردوم، ڕێگا، هەندێ. (ئەردە.) ئەستوور. (باد.) زەند، زەندک، پیپل، هێچک، باڵ، نێوانی شان و ئانیشکێیە، ـــ ی جلکان. دەستە، کۆمەڵە، (فە.) بازوەن. داری ئەملاو لای عەرەبانەیە. چتی ئەستوور. هەرێم، توور، توویر، ناوچە. ـــ ی موکریان: ناوچەی موکریان.

**قۆلاج**: باڵ (بۆ پێوان). (ئەردە.) قولانج.

**قۆلان** (باک.): پشتێند.

**قۆلانج** (ئەردە.): قولانج، نێوانی قامکە چکۆڵەو قامکە گەورەیە.

**قۆلانچە**: قالۆچە. ـــ ژاردار: قالۆچەی ژەهردار. ـــ نەخشینە: قالۆچە نەخشینە.

**قۆلاو** (فە.): هێلانەی مریشک و لانی سەگانە.

**قۆڵایی**: ئەستووری.

**قۆلایی**: تەواوبوون، ئەنجام، پایان، کاتی ڕێک کەوتنی کار.

**قۆلە** (ئەردە.): قۆلانچە.

**قۆڵە** (مەوک.): قەرز، بەڵاّن بە تەنێ بەکارنابرێت بەڵکوو لە پێشەوە لەگەڵ قەرز بەکاردەبرێت وەکوو: قەرزو قۆڵە. ـــ ژارە: قۆڵەژاردارە.

**قۆڵەژاردارە**: قالۆچەی ژەهردارە.

**قۆڵەمە**: ساقۆڵ، لوولاق، لوولاک.

**قۆڵەنەخشینە**: جۆرە قالۆنچەیێکی ڕەنگاوڕەنگە.

**قۆڵەوانە**: باسک بەند، قۆڵ بەند.

**قۆڵبەس**: قۆڵبەست.

**قۆڵبەست**: ئەو کەسەیە قۆڵی بەندییان لە پشتەوە دەبەستێ. بەندییەکە لە پشتەوە هەردوو قۆڵی بەسترابێ. ـــ کردن: بەستنی هەردوو قۆڵی گیراو و بەندی لەپشتەوە بۆ ئەوەی ڕانەکا. ـــ ی: بەستنی هەردوو قۆڵی بەندی لەپشتەوە.

**قۆڵبەن:** قۆڵبەند، قۆڵبەست.

**قۆڵبەند:** بازی بەند، جوورە خشڵێکی ئافرەتانە لە زێڕ یا لەسەر جلکانەوە لە قۆڵدەکرێ وەکوو بازنە وایە لە زێڕ یا لەمزێوی دروستدەکرێ قۆڵبەندی باڵ، بازی بەند، باسک بەند.

**قۆڵبڕ:** دەستبڕ، ساختەچی. ـــ ی: دەستبڕی، ساختەچێتی.

**قۆڵپێچ:** چتێکی درێژە نان پێوەدەر لەکاتی نانکردنێدا لەقۆڵی دەپێچێ تا قۆڵی نەسووتێ.

**قۆڵت:** قوزت.

**قۆڵتخ** (ئەردە.): بنهەنگڵ.

**قۆڵتر:** ووتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە بە مەردومی پیری داکەوتوو دەکوترێت.

**قۆڵتەخورە:** ژێردەریایی.

**قۆڵچی:** باجگیر، پاسەوان، باجگر، پاسەوانی شەو، کە بە ناو ئاواییدا دەخولێتەوە.

**قۆڵچێتی:** پیشەی قۆڵچی.

**قۆڵدارخ:** بازنە.

**قۆڵقۆڵ:** دەستەدەستە، چین چین.

**قۆڵک** (باک.): کەنگر.

**قۆڵکێشان:** مۆرکردن، باوەڕی هاتن، ڕێدان.

**قۆڵلتی** (باک.): لەندەهۆر، بەقەڵافەت، قەڵافەت زەلام.

**قۆڵمە:** لوولاک.

**قۆڵنج:** قوڵتوغ، بنهەنگڵ. (بابا.، هەورا.) کوڵنج، نەخۆشییەکە لە سەرماوە دەماری شان و ملان ڕەق دەبێ دەست بەمژانێ دەکەن. بۆ ئارامکردنی ژانی شان و ملی قۆڵنجدار زەنجەفیل و دوورگ تێکەڵ یەکتری کرێن و سەرشان و پیلی پێ چەوور کرێ لە گەرماوێدا ئارەقەیێکی باش دەکات و شان و پیلی نەرم دەبێ ئەوسا قۆڵنجی بشکێنرێ باشە، زاخ و زەنجەفیل و شیریش زۆر باشە، ڕەشکە بە کوتراوی لەگەڵ دوورگی بکوترێ و گەرمی بکەن و لەسەر شان و قۆڵیدا بنێن زۆر زۆر باشە.

**قۆڵندەر** (باک.): گیشەی دارییە.

**قۆڵۆرچ** (باک.): شاخ، قۆچ.

**قۆڵ هەڵتەکاندن:** سۆزانی ڕاوەشاندن.

**قۆڵ هەڵتەکێن:** سۆزانی تەکاندەر.

**قۆڵهەڵکرو:** مرۆڤی قۆڵهەڵکراو و گورج و گۆڵ.

**قۆڵهەڵکردن:** قۆڵهەڵماڵین.

**قۆڵهەماڵرو:** قۆڵهەڵکراو.

**قۆڵهەڵماڵین:** خۆ ئامادەکردن بۆکار.

**قۆڵی:** قوولی.

**قۆڵییەین** (بار.): بە لەت بوونی دارێکی دەڵێن، کە لە بنەوە شکابێ، هەڵپەڕدراو.

**قۆڵیت** (باک.): بیر، چاڵاو.

**قۆم:** خزم لە تایفە، تیرەو ڕەگەز.

**قۆمان:** قەومان.

**قۆماندن:** قەوماندن، هەڵاییساندنی کارێکی ناخۆش.

**قۆمانن:** قەوماندن.

**قۆمە:** کێشە، رووشە، گێچەڵ.

**قۆمیان:** قەومان، بەرپابوون.

**قۆمین:** قەومان.

**قۆناخ:** چەقز، بنگە، مەڵبەند، مەڵبەنان، جێگای تێدا حاوانەوە، قۆناغ، مێوانخانە، ئێرەو کۆیە ماوەی دووقۆناغەرێیە، ماوەی ڕۆژە ڕێگایەک. دیوەخانە. قونداغی تفەنگی.

**قۆناخە:** قونداخە، قۆناغە. ـــ پێچ: قونداغەپێچ، پارچە تنراوێکی درێژە مندالی پێ قونداغە دەکرێ.

**قۆنارغ:** قۆناخ، دیوەخانە. ڕێگای شەقلاوە (٢) قۆناغە.

**قۆناغە:** قونداغەی منداڵان، مەلۆتکەیەکە لەنێو ـــ هوە پێچرابێ. بابۆڵە. ـــ کردن: تێوەپێچانی مەلۆتکەیە لە قونداغەو قوماتەکردنی.

**قۆنەرە:** قۆندرە، پێلاو.

**قۆنەقۆن:** ڕۆیشتن بە هەنیسکە برکێ و تەکەتەک. بارام بە ـــ هات.

**قۆنتاخ:** قۆناغی تفەنگ.

**قۆنداخ:** (کە.) قۆناخ، بەشی خوارەوەی تفەنگییە، دارە، قونداغەی تفەنگ.

**قۆنداخە:** قۆناخە، مەلۆتکە، قۆنداغ. ـــ کردن: مەلۆتکەکردن.

**قۆندارغ:** قۆناخ، پاژنەی تفەنگ.

قۆندەرە

**قۆندەرە:** قۆندرە.

**قۆندەرەچی:** قۆندرەچی، کەسێکە هەر قۆندرە دروست بکات.

**قۆندەرەکردن:** قۆنگرەکردن.

**قۆندرە:** قۆندەرە، کەوش، پێلاو، (ڕۆژ.) تایاخ.

**قۆندرەچێتی:** پیشەی قۆندرەچیان.

**قۆندرەچی:** قۆندرەساز، کەسێکە پیشەی هەر قۆندرە دروستکردن بێ.

**قۆندرەی خلیسکێ:** تریشۆنک.

**قۆنسوول:** نوێنەری باڵیۆزی.

**قۆنگرە** (هەو.، هەورا.): بورج وقەڵاتی شەرێ، شووێنی بەرز بۆ چاودێری چتێک.

**قۆنگرەی شهامێ:** قەڵاتێکە کەوتووتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕەوانەزی، هی میرییە.

**قۆنگرە** (هەو.، هەورا.): (هەو.) قورینگە. ئاوێکە، کە بە سەر بەردیدا بڕوا هەڵدەبەزێتەوە. ـــ کردن: بەرزبوونەوەی ئاوی خوڕە لەنێو چۆم و جۆگاندا بە هۆی خرگەو گاشەبەرداندا.

**قۆنگرۆکە:** قۆنگرە، کۆنگرەی گچکە، بورجی شەرێ.

**قۆنیارغ:** قۆنیاک، کۆنیاک.

**قۆیتاس:** نێوی پیاوانە.

**قۆیتاسە:** جوورە خشڵێکی ژنانە لەزێر یا لەمزێو دروستدەکرێ بە سەریانی دادەکەن و بە پشتەوەدا شۆڕ دەبێتەوە، قۆتاسە، وەکوو زەنگوڵە وایە.

**قوب:** بانی بەتاق دروسکراوی بڵند، گومەز، دوگمە، زۆپ، زەق. *

**قوبا** (ئەردە.): وولێن، سەودا، خارشت، خورشتی لەش.

**قوباو:** نێوی پیاوانە.

**قوبلا** (باک.): زوو. ـــ اسبێ: بەیانی زوو.

**قوبە:** قوبـە، قوویقوبـە، گوبـە، گومـەز، گومبـەزی گـەرماو و مزگـەوتان و ئیتر. ـــ ی زێڕ و زێوی کەمەران: قوبپەی خڕی کەمبەران.

**قوبقوبە:** (هەورا.) قوبە، گۆی سەرەوەی تاسـی سـەری ژنانـە لـەزێڕ یـا لـە زێو دروستدەکرێ.

**قوبک:** :زۆپ، گۆمبەز. *

**قوبکە** (ئەردە.): قوپکە، گومبەز.

**قوبگـە** (ئەردە.): گۆی سەر ئالاّو بەیداخان.

**قوبوولی:** جوورە پلاّوێکی یەکاوەو ناپاڵێورێ، دەم پوخت.

**قوپ** (هەورا.): قوم (بۆ ئاورو چاو شلەمەنی). ـــ یک ئاو: قومێک ئاو یـا دەرمان.

**قوپان:** تەپین، بەناوداچوون، چاڵبوون، (کـە.) قۆپـان، کووپـان، ڕۆچوون، داکەوتن، تەپقبوون.

**قوپـاندن:** قۆپاندن، (کـە.) چـاڵکردن، ڕۆچوانـدن، داکـەواندن، تـەپک کردن، تەپق کردن، بەناودا بردنی هەندێ چت بە نهێم.

**قوپاو:** ڕۆچوو، ڕۆچووا‌و، تەپق، تەپک، تەپق بوو.

**قوپکە، قوبکە** (ئەردە.): گومـەز، گومبەز، قوبەکە.

**قوپۆز:** قەپۆز، گرێیەکیشە لە نێوەڕاستی نیری جووتیدا.

**قوپووز** (ئەردە.): قەپۆز، هەوا، فیز، قومپوز.

**قوپیان:** قوپان، چاڵبوون، چاڵداکەفتن، بەناوداچوون.

**قوت** (بـاک.): ژێ ـــ بـوون: جـووێ بوونـەوە. ـــ کـرن: دوو‌ایـی هێنـان، براندنەوە. (باد.) کورتەبالاّ بۆ هـەموو گیـان لەبەرێکییـە،هـەرزەوبێ ژێـر. قەتیز، چاوەڕێ، مالاّتی گووێ کورت، هوشیار، وورریاو قنج. قیت، قنـج، بەرز، بڵند. ـــ بوونەوە: قیت بوونەوە.هەرزە، گەوج، گێل.

**قوتابخانـە:** خووێندنگـە. ـــ ئامـادەیی. ـــ پزشـکی. ـــ کشـت وکـاڵ. ـــ شەری. ـــ دادگەری.

**قوتابی:** شاگردی قوتابخانە، فەقێ، منداڵێکە لە قوتابخانە بخووێنێ.

**قوتـار:** ڕزگـار، دەربـاز، ئاسـوودە، ئـازاد. ـــ بوون: ڕزگـاربوون. ـــ کـردن: ڕزگـارکردن، دەربـازکردن. قـەتار، چـەند وولاّخێکـە بـەرو دوا بـە ڕێگایـەدا بڕۆن.

**قوتان** (فـە.): کۆخین. (زا.) کوتان.

**قوتاندن** (فـە.): کۆخاندن.

**قوتانن** (فـە.): کۆخین.

**قوتاوی:** قوتابی.

**قوتە:** قوت، گت، گتە، پـەند. چەکـە، ڕووتـە، ڕووتـەڵ، ڕووتەڵـە. وورریـا، ووشـیار. قوڵـە، مـەردومی قـوت. قوتـابی. (فـە.) کۆخـە. ئـاژاڵ یـا وولاّخێکە گووێی کورت بێ.

**قوتایی:** بڵندی، بڵنی، قۆقزایی، شووێنی قوتە لە زەویدا، بڵندایی.

**قوتەرە:** کۆتەرە، دۆڵیانی ئاش.

**قوتـەڕەش** (خـۆ.): بـزن، گیسـک یـا کاریلەیەکـە گووێیـەکانی ڕەش و کورتبن.

**قوتەسۆر** (خۆ.): بزن، گیسک یا کاریلەیەکە گووێیەکانی سوور و شۆڕبێ.

**قوتەشین:** بزنێکە گووێی قوت و لەشی شین بێ.

**قوتەقوت:** زۆر خۆ نیشاندان. وەدووی چتێکی نهێنی کـەوتن. جووڵانـەوە، جووڵەجووڵ، قنجەقنج، هەڵپەڕوداپەڕ.

**قوتەک:** پۆشاکێکی کورتە لەسەر کراسەوە لەبەر دەکرێ.

**قوتەموور** (خۆ.): مـەڕ یـا بزنێکـە گووێیـە کـانی قـوت و گچکـە بـن وەکـوو بەڕوو، (خۆ.) قوتەموت.

**قوتبەیی:** تیرەییێکە لە لوڕ.

**قوتبوونەوە:** قیت بوونەوە، قنج بوونەوە.

**قوتحە** (ئەردە.): چتی زۆر چاک، جووان، خاس، فرەخاس.

**قوترمەپا** (هەورا.): قولاپە، قولەپێ.

**قوتفین** (زا.): سڕبوون لە سەرمان.

**قوتک** (ڕەوا.): نێوچاوانی ئافرەتانە، کە توکەکەی بڕابێتەوە. کوڵەجەی ئافرەتانـە، کـە قۆڵـی کـورت بـێ. (بـاک.) سـیخمە، بـە کـەوای قوڵـەی ژنانیش دەڵێن، سوخمە.

**قوتکـە:** هـەنجیری ووشـک، داوە دەزووی کـورت، قـرتم. تـێزە، کۆنگـرە، تەپۆڵکە، قیتکە، سەری شاخان و شووێنی بەرز. لووتکـەی چیـاو هـەموو شووێنێکی بڵندە، کەپک، بارگە، پارگە.

**قوتکردن:** کورتکردنەوە.

**قوتکردنەوە:** قنج کردنەوە.

**قوتم** (زا.): کورتمە، دارێکە لە زەویدا مابێتەوە دووای بڕینی.

**قوتمسان:** هەڵپسان.

**قوتمسـاندن:** هەڵپساندنی گوڵ و گیاو ئیتر، کە ئافرەتـان بـە پـرچ یـا بـە شەدەکانیاندا دەکەن.

**قوتـنی:** جـوورە پارچەیـەکی دێـغ دێـغ و ڕەنگـاوڕەنگ بـوو لـە لۆکـە دروستدەکرا، دەکرایە کەواو پانتۆڵ.

**قوتـوو** (ئـەردە.): خلێـف، دوویـارەی هـەنگووین. قۆدی، (هـەو.) قۆتـی، قووتی، گەروانک، (باک.) مەخمەر.

**قوتووی جگـەرە** (هەورا.): قوتووی جغارە، قۆدی جگەرە.

**قرتووقایم:** مـەحکەم، پاوەجێ، پایەدار، قایم.

**قوتووقەوی:** قوت وقۆڵ.

**قوتووقۆڵ:** قوت وقەوی، ئەستوور، گۆشتن.

**قوتیان** (فـە.): کۆخین.

**قوتیلە:** قوتوولـە.

**قوڕ:** پشکووڵ، بشکووڵ، کوڕ، گیل، هەڕ، هەڕی، حەرگ، (فـە.) خـەڕگ، (ئەردە.) هەرگ. قوڕ لە ئاو و گڵ دروستدەکرێ، کـە ئـەردە کـە بـە بـەفر یـا ئاو یا باران تەڕبێ دەبێتە قوڕ، قوڕ سەربان و دیواری هەژارانی پێ سـوواخ دەدرێت. ـــ ی سوواخێ: کاپۆل.

**قوڕاچکە** (ئەردە.): قوڕقوڕاچکە.، گەروو، گەلوو.

**قوراد:** بەربەسێل.

**قوراده** (کە.): کوڕاده. کنی واڵ، پیف، گیایەکە کەژی لە ڕەنگ و تامدا و بنکدا وەکوو کەوەرە جیاوازیان ئەوەیە کەوەر ماڵییە قوراده کەژییە دەکرێتە کەلانە.

**قوراده:** مسی شکاو، جوورە پیوازێکە سەلکەکەی هەرگیز گەورە و خڕنابێ.

**قورافتن** (باک.): لە ڕیشە هەڵکەندن، ڕنینی تڕێ و بڕینی گوڵی دانەوێڵە. (کۆ.) ڕووسە، بوورەدێر، ڕووی زەوی ڕەق ووشک ناوکردن تا بکێڵرێ.

**قوراڵه:** گیای قوراده.

**قوران:** سیپارە.

**قوران خواردن:** سووێندخواردن بە قوران.

**قوراندان:** سووێنددان بە قوران.

**قوراو:** ئاوێکە بەهۆی قوڕەوە لێڵ بووبێ. (ئەردە.) هەرگا، چڵپاو، چڵکاو. (هەو.) بەربەسێلی شلە. ـــ ی: پشکووڵ، بشکووڵ (باک.). کسێکە یا چتێکە لە قوڕەوە چووبێ.

**قوراوێلکه** (کۆ.): باڵندەیێکە وەک (بۆرەجرە) وایە بەڵام ئەو گەورەتر و قاچیشی درێژترە. جوورە ماسییەکیشە.

**قورایه** (بابا.): کوڕاده.

**قوره** (زا.): دژشاوی بەرسیلەو قوڕەی.

**قورەبان:** هەرەسی، (کۆ.) قورەپەست، (هەورا.) هەرەبان.

**قورەبەشە:** کورەبەشە، داعبایەکە.

**قورەپەست:** قوڕپەست. هەرەپەست، قوڕێکە پێ پەستکرابێ، قورەتێنە، قورەبانێکە، کە لەسەر گڵباخەوە دەکرێ. مۆرە، تفە.

**قورەپەستکردن:** قوڕپەستکردن.

**قورەتێته:** (باک.) چەقێن.

**قورەڕەش:** جوورە قوڕێکی ڕەشە بەنی پێ ڕەشدەکەن. قورە سیان.

**قورەژێلکه:** زیندەوارێکی ئاوییە.

**قورەسووره:** جوورە قوڕێکی سووری پاکە چتێکی، کە سەگ ئاوەگڵی کردبێت، بە ـــ پاک دەکرێتەوە، بۆ لەمریش لە لەشدەدرێ.

**قورەکاری:** خەریک بوون بەکارو باری قورەکاریەوە.

**قورەمە:** تفاقی جووت. زمانەی هەوجاڕ ئەوەی گاسنی پێدا دەچێت.

**قورەمکاری:** قوڕکاری.

**قورەماسی** (کۆ.): جوورە ماسییەکە.

**قوربان:** گۆری، بەلاگەردان، (هەورا.) پایەنداز، پێشبار، گاو و گەردوون، پێناو، سەرگەرد، قوچ، قوچی قوربان، گۆشتی قوربان، (جا.) بڕێتی، سەرگۆر، کوشتی. بە ـــ بوون: دەبەرمردن، خۆلە پێناونان، لەبەر گەڕان. ـــ کردن: لەسەر گەڕاندن، لەسەر گێڕان، لەبەر گێڕان. بۆ ڕێزگرتنی ئەو کەسەش بەکاردەبرێ، کە قسەی لەگەڵ دەکرێت. ـــ ی: کوشتییەکە، کە لە چووار ڕۆژەی جەژنەی قوربانێدا سەر ببڕێ بە ناوی قوچەوە.

**قوربانی کردن:** قوربانی کردن لەچووار ڕۆژەی جەژنی قوربانێدا بەناوی قوچەوە.

**قورباق:** قەرباقە، داعبایەکی ئاوییە، بۆق.

**قوربەسەر:** کز، چارەڕەش، خۆشەویست لێ مردوو، لێ قەوماو، هەژار. ـــ ی: کزی، چارەڕەشی، لێ قەوماوی، هەژاری.

**قوربەست:** قوڕێکە لەسەر شووێنێکی بە ئەستووری ڕۆ کرابێ، قورەپەست. ـــ کردن: ڕۆکردنی قوڕ بە ئەستووری، قورەپەستکردن.

**قوربەشک:** دڕندەیێکە لەنێوانی سەگ و پشیلەیدایە، نوختەنوختەی ڕەشی لە لەشیدایە.

**قورپێوەدان:** وێرانکردن یا تێکدانی چتێک.

**قوربوون** (فە.): سوور بوونەوە.

**قورپ:** قرخێنە، هێڵنج.

**قورپێوان:** داد وهاوارکردن، خەفەت خواردن، ماندووبوون، شیوەن کردن.

**قورت:** چەوتی و گێری لە هەمووچتێکیدا. چاڵ، چەپاڵەی ڕۆژگار.

**قورت** (باک.): قوم. ـــ ێک ئاف: قومێک ئاو.

**قورتاس:** قوتار. ـــ بوون: قوتاربوون.

**قورتپەسە:** قورە پەستە.

**قورتاندن:** لچ هەڵقرچاندن.

**قورتانن:** قورتاندن.

**قورته:** دەنگی گەرووە لە سەرمان یان لەبەر گریان. لرخە. (جا.) باڵندەیێکی سوور وسپی و ڕەشی تێکەڵاوە بەقەدەر ڕەشۆڵەیێکی دەبێ لە جێگایانی زۆر ئاستەم لە کێواندا هێلانەی دەکا، گۆیا ئەگەر گڵی هێلانەکەی وی لە هەر برینێکی کۆنی وولاخ و ئاژاڵان بدرێ، چاکی دەکاتەوە.

**قورتقورتاوی:** چتی لق لق.

**قورتک:** قورته.

**قورتم:** لووتی فیلییە و هێندە درێژە دەگاتە زەوی خواردەمەنی پێهەڵدەگرێ و بۆ زاری دەبا. (موک.) گەروو، قوم، قورقوراگە.

**قورتێکەر:** کرێکارێکە، کە هەر قورتێکا بۆ قورکێش.

**قورچ:** قورت.

**قورچک** (باک.): خانوویەکی گچکەیە، کۆخ.

**قورچمین:** هەڵپچڕاندنی گیا، هەڵپچڕکاندن.

**قورخ** (زا.): ئەستێرەی گەلاوێژ.

**قورخێنه** (هەورا.): قرخێنە، قرپە.

**قورداده‌ر:** کەسێکە، کە هەر قوڕدا بدا لەسەر چینی دیواری بۆ وەستا.

**قورس:** خەپلە، کولیچە، خڕت. قورسوقۆڵ، گران، سەنگین، مرۆی سەنگین، گوێیەکە گران بووبێ.

**قورساندن** (باک.): سەرسامکردن.

**قورسایی:** گرانایی، سەنگ، قورسە، گرانی یا قورسی.

**قورسه:** قورسایی.

**قورسەسیاوه** (هەورا.): کۆخەرمشە.

**قورسەلێدان:** ساختەلێکردن.

**قورسەنیلو** (هەورا.): ڕەشەگرانەتا.

**قورسکه:** دەنگی سەگ لەکاتی ئازار پێ گەیشتنیدا.

**قوڕسکەقوڕسک**: نووسکەنووسکی سەگ لەکاتی ئازار پێ گەیشتنیدا یەک لەدوای یەکتر.

**قورسوقەمەر**: مەبەس لە مرۆی گەورە و گران و سەنگینە.

**قورسوقۆڵ**: چتی دار یێزراوی قایم، قایم، سەنگین، مەحکەم.

**قورسهەڵگر**: ئامرازێکە چتی قورس لەسەر پشتی لۆری دادەنێ و دەشی هێنێتەخوارێ.

**قورسی**: پتەوی، پڕ، بارسایی، بڵندی. کورسی. گرانی، گرانایی، سەنگینی، قورسایی، بریتیشە لە سەنگینی و گرانی مرۆڤان.

**قورسی کەمەر**: بەری گیایەکی گەرمیانییە ناوکێکی سپی هەیە بە کوتراوی بۆ ڕەوانی لە دەمی منداڵی ساوا دەکرێ.

**قورسین**: سەرسام بوون، واق وڕمان.

**قورسی نەعنا**: نوقڵێکی پانی گردە لە شەکرو ئارەقی نەعنا دروستدەکرێ.

**قوڕشێل**: کرێکارێکە، کە هەر قوڕی بشێلێ و خۆشی کات.

**قورغ**: ئەستێرەی ڕۆژی، ئەستێرەیەک.

**قوڕقوڕ** (باک.): قەلەرەشە.

**قوڕقوڕاچکە**: قوڕقوڕاگە، قوڕاچکە، قوڕگ، گەروو، گەلوو.

**قوڕقوڕاگە**: قوڕقوڕۆچکە، قرقرۆچکە، هەفک، قوڕقوڕتە، قوڕوو، (کۆ.) قرقرتۆک. قوڕقوڕاکێ، قەرقارک، گەروو، قوڕگ (بۆڕی هەناسەیە).

**قوڕقوڕاکێ** (هەورا.): گەروو.

**قوڕقوڕتە** (فە.): قوڕقوڕاگە.

**قوڕقوڕۆچکە**: قوڕقوڕاگە.

**قوڕقوشم**: مز، خوردەک.

**قوڕقینە**: قرخێنە.

**قوڕکردنەوە** (فە.): سوورکردنەوە.

**قوڕکێش**: کرێکارێکە، کە هەر قوڕیکێشی بۆ وەستا. ــ ان: قوڕ بردن بۆ سەر نیش بۆ لای وەستا. ــ ی: قوڕکێشان.

**قوڕگ**: گەروو، قوڕقوڕاگە، گەلوو، قوڕاچکە.

**قوڕگدڕاو**: مەبەس لە مرۆی چەنەبازو دەنگزلە. مەردومی چاوبرسی و زۆرخۆر.

**قوڕگدڕیاگ**: قوڕگدڕاو، گەلوو دڕیاگ. زگبرسی، تێرنەخۆر.

**قوڕگرتنەوە**: لە گڵ و ئاو قوڕ دروستکردن بۆکار.

**قورم** (کە.): قەلاڤەت، دیمەن. (موک.) قورمی میچی، تەن، تەنی، (هەورا.) دوو وەرزن، دووکەڵ ژن. (باد.) بنکی درەخت. (باک.) کرم.

**قورمساخ**: دەویت، گەواد، تەرەس، ژنحیز. ــ ی: دەویتی، گەوادی، تەرەسی.

**قورمساغ**: قورمساخ، ژنحیز. ــ ی: قورمساخی.

**قورمسان** (زێ.): پسان.

**قورمساندن** (زێ.): پساندن.

**قورمک** (باک.): کرمی گچکە.

**قورمیچاک** (باک.): چرچی، چین و لۆچی ڕوو.

**قورمیش**: دانانەوە، کۆک. ــ کردن: کۆک کردنی کاتژمێر.

**قورنازک**: ئانیشک.

**قورنانەسەرچاو**: بریتییە لە داغ و خەفەت کردن بە دڵی کەسێکیدا.

**قورناویلکە**: داعبایەکی درێژی بچکۆڵەی ئاوییە لە بەهاراندا پەیدا دەبێ و دەنگێکی زلی هەیە.

**قورنە**: گۆشەی ژوور یا حەوش.

**قورنەت** (باک.، باد.): حەوز، قورنە.

**قورنچک**: نوقورچک.

**قورۆ** (ئەردە.): زوقم، خووس، (ئەردە.) خوویز.

**قورۆش**: پارەیێکە بەرانبەری پازدە شاییە.

**قورۆک**: کولۆر، کورۆک.

**قورۆل** (هەورا.): کلۆر، کولۆر. ــ ی (هەورا.): کلۆری، کولۆری.

**قورۆمە** (ڕەوا.): بافیش، ساختە، فۆرتە. هەوجاڕ. (ڕەوا.) ــ چی: بافیشکار، ساختەچی، فۆرتەچی.

**قورور** (بابا.): قوڕقوڕۆچکە.

**قورواق** (هەورا.): بۆق، قوڕ.

**قوروقە**: بۆق.

**قوروان**: قوربان، سەرگەرد. ــ ی: قوربانی، سەرگەردی.

**قوروڵ** (ئەردە.): پووت، پووچ، پووچەڵ.

**قوروچڵپاو**: (بابا.) چەلب.

**قوروش**: پارچە دراوێکی کانزایی گچکە بووە.*

**قوروو** (بابا.): قوڕقوڕۆچکە، قوڕگ.

**قورووشکان**: نووسکان، قووراندنی سەگ.

**قورووچک** (باک.): کورت.

**قورووسکەقورووسک**: نوسکەنوسک، قوورەقوور.

**قورووسکاندن**: نوسکاندنی سەگ لەکاتی ئازاردا.

**قورووقە**: بڵاوبوونەوەی چەند سوارێکە لەکاتی هێرشدا.

**قوروقەپ**: قەروقەپ، قوڕوقەپ. قرقەپ، بێ دەنگ، مش.

**قوروقەپۆز**: قرقەپۆز.

**قوروقسل**: چتێکە دەگیرێتەوە لە گڵ و قسڵ بۆ بەکارهێنانی لە بناغەی دیواری.

**قورووگ**: قوڕگ.

**قوروونچک**: نقوورچک.

**قوری**: خەرمانی شیشەتووتن. قووڵکەنار، چاڵی ئاوێ. گۆل، حەوز.

**قورین**: چتێکە لە قوڕ دروستدەکرێ.

**قوریانە**: گیاندارێکە پێی دەڵێن قوڕی.

**قورینجاندن**: هەڵقورینجاندن. قونجڕکە.

**قورینک**: قولێنک، قولنگ.

**قورینگە** (کۆ.): گیایەکە وەلاولاوی دەچێ گوڵیشی هەر وە نیوی دەچێ بەڵام سپییە.

**قوز**: زەها، ئەندامی شەرمی ئافرەتان، دامێنی ئافرەت، هوولە، (هەورا.) کوس، (ڕۆژ.) کوز، زێ، ماڵ.

**قوزه:** لا قوروڵەکەی جگییە.

**قوزەسووتەکێ:** سووتانەوە و سووربوونەوەی زێی کچی منداڵ.

**قوزەڵقورت:** قوززەلقورت.

**قوززەڵقورت:** دەردێکە وەکوو سندان لە گیاندارو کاڵەک و شووتی و ترێ‌زووی دەدا، بۆ جنێویش بەکاردەبرێ. قزە، قزەڵقورت، زڵفنج، ژەقنەموت، زڵفنجاو، ژەقنە، کندرووس، زەبرەبەند، ڕەنگە تامی گووژاڵک یا چتێکی تاڵتربێ، بۆ جنێو بەکاردەبرێ، نەخۆشییێکی ناسراوە.

**قوزبڕکە** (بار.): مڵەدروکلکە، برێتییە لە چەقۆی گچکە.

**قوزگە** (هەورا.، باد.): قزگە.

**قوزمەز** (باک.): گیایەکە.

**قوزولقورت:** قوزەلقورت.

**قوژبن:** قولینچک، کەلێن، پەنا، پەناو، پەسیو، قولینچک، گۆشە، کونچک، (ڕەوا.) قوڕنیشک.

**قوژبندار:** (باک.)بستی، گۆشەدار، سووچدار.

**قوس:** قوز، زێ.

**قوسسان** (زا.): ئاوسان و کوترانی پێ لەبەر زۆر ڕۆیشتن.

**قوش:** باز، واشە، باڵندەی ڕاوێ. (زا.) خەرمانێکە ئامادە کرابێ بۆ کوتان.

**قوشقن:** باڵدور، قایشێکە بەزینی چارەوێ دەکەوێتە ژێر کلکی.

**قوشقنە:** قوشقن.

**قوشقن بوون:** قوشقی بوون.

**قوشقی:** سڵ، تووڕە، ئاڵۆز. سەرسام. ــ بوون: سەرسام بوون، تووڕەبوون. ــ کردن: سەرسام کردن، تووڕەکردن.

**قوشیلک:** خوژیلک، شیرکوتک، گیایەکە بۆ ڕەوانی زۆرباشە.

**قوفە:** قوففە.

**قوففە:** قایەخ.

**قوفەدان:** قایخەوان.

**قوفڵ:** قفڵ، گۆڵە، سڕی، تەزی سەرما.*

**قوفلک:** دەست بەندی ژنان بۆ جوانی.*

**قوفلین** (زا.): زۆر سەرمابوون، ڕەق بوونەوە لە سەرمان.

**قول:** کوڵ، کولان، جۆش. ڕەش، قولەڕەش، چەپکە. دەسکێکی گچکە و کەم لە گەنم و جۆی شین و گوڵ و گیاو چیلکە، (باک.) قەفت، دەسکە، قولچە، سەلووک. چتی کوڵ، قوڵپی چت لەسەر ئاگر، سەری تیژی هێلکە. (باک.) کون. ــ کردن: کونکردن. باش ڕێستانی هەلووک بە جۆرێک، کە ژێرەکەی بۆش بێ، بۆ ئەوەی تا کە بە دار هەلووک لێتدا بەرزبێتەوە. بەش، پەش، پشک. (موک.) دەست، چەنگ، پڕ بەدەستی گژو گیا. (فە.) لاق، قاچ، قاچ وقول، پێ بەندەی ڕەشکۆڵە، زەنگە. (فە.، موک.) پێ لەگەڵ قاپی بەکاردەبرێ. (هەورا.)قوڵتە، کوور، کونی دیوارو چتی تر. (باک.) چڵ، ــ دان: چڵدان. مرۆڤی پێست ڕەش، بەندەی ڕەشکۆڵەی پێست ڕەش، قولەڕەش. قولە.

**قولاپ:** نەیک، چەنگاڵ، دریشەیێکی چقەداری تیژە بە لووتەکەی چەرمی پێ کوندەکرێت و بە چقەکەی دەزوو لەگەڵ خۆی دەهێنێتە دەرەوە. ئاسنێکی لووت تیژی چەماوەیە چتی پێدا دەکرێ. ــ ی ماسی گرتنێ: شەوکە. شەوک، نەق، قولەپێ، قولاپە، ــ ی کڵاوی ژنان.

**قولاپە:** قولەپێ، گووێزنک، قاپەڕەقە، ڕەگەکەی پشتەوەی پانییە، گوهیشک. چتێکی لووت چەماوەی تیژە دەگیرێنرێتە هێندێ چت.

**قولاپەدۆز:** کەسێکە بە قولاپی چتی بچنێ و بدروێ.

**قولاپەدووزی:** قووندەرز، دروونی چت بە قولاپ.

**قولاپێ** (جا.): قولاپە.

**قولاپێ ماسی گرتنێ:** چەنگەک.

**قولات:** ئەندازەییێکی زۆر.

**قولاج** (ئەردە.): قولانج.

**قولاچ:** قولاچە: قالۆچە.

**قولاچە** (بار.): دووباڵی کراوەوە، پێوانەییێکە، بە درێژایی دوو دەستی کراوەوە.

**قولاخ:** بنکاچ لەناو گۆمی ئاویدا، کە ماسی لەزستانێدا خۆی تێدا بۆسەدەدا. جێگای دابەشکردنی ئاوە بۆ مەرزە لەلای سەرروویەوە. پارچەیەکە لە لەشی ئاژاڵ، کە دڕندە خواردبێتی یا مردار بوویێتەوە و شووان بۆ بەڵگە هێنابێتیەوە لای خاوەنی. کەوڵ و پێستی گیاندار. شووێن، شووێنەهەوار. کیف، بەرگ، پێست، تێکوڵ. مۆڵ بوونی ماسی و ئاژاڵە.

**قولاخە:** مۆڵ بوونی ماسی و ئاژاڵە.

**قولاخە:** کۆمەڵ.

**قولاخەدان:** کۆمەڵ بوون و بەسەر یەکتری کەوتنی ماسی لەسەرمادا. کۆمەڵ بوونی گیاندار.

**قولاخی:** قالاخی، ڕەش، کراسی ڕەشی تازیەداری.

**قولاری** (هەرت.، خۆ.): ڕەقاز.

**قولان** (کە.): گەمەییێکە لەپشتەوە منداڵێک لاقێکی بڵنددەکا و قامکی دەگرێ و لەسەر لاقێکی ڕەپێی هاوالاکانی دەنێ.

**قولانج:** (باک.) بانک، (باد.) قیلاج، نێوانی دوو قامکی گەورە و دۆشاومژەی ئاوەڵەیە بۆ چت پێوان.

**قولانچە:** قالۆچە، گورخلێنکە، قالۆنچە.

**قولاندن:** هەراکردن بە دەنگی بەرز.*

**قولامورغ** (فە.): کولانەی مریشکێ.

**قولای بانکێف:** دژی سەرکێوان.

**قوڵە:** ووشترگەلوو. سەری چالایی هێلکە. چارەوێی ڕەنگ شێ. سەرە تیژەکەی هێلکەیە، ناوی دێیەکیشە لەنزیک خانەقین. گیانداری کلک کورت. قولخ.

**قولە:** قولله، تەپڵسەری شاخ و گرد و داری بەرز. چارەوێی ڕەنگ شێ.

**قوڵەبازەڵە** (ئەردە.): قەلەپاچکە.

**قوڵەبانک** (باد.): بەر هەیوانێکی سەرباندارە نووێن و چتی تری لەسەر دادەنرێ.

**قوڵەبەراز:** کوردەڵە بەراز، کوڵەبەراز.

**قوڵەبنە:** خڕین، تێکسرماو، کورتەبنە، خڕیلاتە، خڕیلە، کورت وقەڵەو، بانۆڵە، کنک، دووگوردی، خڕو کورتەبالاّ، کوڵەبنە، خڕو پڕ، دووقوولـری، خەپەتۆڵە، خەپلە، خەپەرە، خەپەتۆرە، خەپانە، خشپن، قوڵەپانکێ، خڕو مر، مەندین، بونیە قەڵەوو کورت.

**قوڵەپانکە:** قولەبنە.

**قولەپە** (ئەردە.): قولاپە.

**قولەپسکێ** (ئەردە.): سستی لە ڕۆییشتنا.

**قولەپێ** (هەورا.): قولاپە.

**قوڵەپێچ:** ڕەپێچەک. ــ دان: ڕەپێچەکدان.

**قولەتێن:** ئەندازەیێکە لە ئاو، کە چوویتە ئاوی ڕەنگی تێک نەچێ و پیس نەبێت.

**قوڵەچۆماخ:** کوتەک، کوتەکی کورت، قوڵەدار.

**قولەڕەش** (مـوک.): گیایەکە لـە مێرگاندا دەڕوێ بـۆ ئـالیکی وولاّخـان دەستدەدات.

**قولەشـین** (مـوک.): گیایەکـە لـەناو قۆپـی و مێرگـاندا دەڕوێ دەکرێتـە ئالیکی ئاژاڵ و وولاّخان. کەروێشک.

**قوڵەفیسقە** (ئەردە.): قولەپێ، قولاپە.

**قوڵەقاچ:** قولاپە.

**قوڵەقۆچکە** (باک.): کۆچکە.

**قوڵەقوڵ** (ئەردە.): قوڵتەقوڵتی چت لەسـەر ئـاوور، کوڵەکوڵ، (ئـەردە.) قڵتەقڵت.

**قولەک** (باک.): تیر، گیایەکی گەلاّپانیشە بەسەر زەویدا پاندەبێتەوە.

**قولەمشت:** قولی مشت. ــ ێ: چتێکە بە پەنهانی بیخەیتە قولی مشـتی یەکێکەوە.

**قوڵەنج** (فە.): هەنگاو، شەقاو.

**قوڵەنگ:** قولنک.

**قولەنگە:** قوڵنگە.

**قوڵەوییەب:** ماری کتکی، مەشکەدز، (هەو.) کۆرەوەییـاب، کووێرەمـار، کۆرەمار.

**قوللە:** چپە، کلاّوە، قەڵەپۆپە، پۆپە، تۆقە سەری چتی.

**قوللەی کێوی:** پۆز، (باک.) دهار.

**قولباریک:** پێ باریک.

**قولب:** قوڵف.

**قولبوون:** کون بوونی چت.

**قوڵبێقل** (باک.): تفنک، کونەکەپۆ.

**قوڵپ:** بڵقی ئـاو لـە کـانیدا لـەکاتی هـەڵقوڵانیدا. هەنیسـکی گریـان. (هـەورا.) پێنجقڕانـی تۆقەسـەری ژنانـە. بڵقـی چتـی شل لەسـەر ئـاوور. قڵپ، قلف، قوڵف.

**قوڵپاندن** (باک.): قڵپ کردنەوە.

**قوڵپە:** قڵف، قڵپە، قوڵتە. دەنگی کوڵینی چتی شل، قوڵپەقوڵپ.

**قوڵپەژێر** (هەو.): بەری گوڵەهێرۆ.

**قوڵپەقوڵپ:** قوڵتەقوڵت، بڵقەبڵق، قڵپەقڵپی یەک لەدووای یەکتری.

**قوڵپچە** (هەورا.): دوگمە.

**قوڵپەدان:** بڵقدانی ئـاو لـەکاتی هـەڵقولاّن ویـا کولاّنیـدا. هەنیسک دان لـە گریانێدا.

**قوڵپک** (باک.): گرتنی کاتی. داڕزان، دوگمە.

**قوڵپن:** مەردومی خڕنەی قەڵەو.

**قوڵپنە:** قوڵپن.

**قوڵپین:** قڵپ بوونەوە.

**قوڵت:** کولاّنی چتە لەناو مەنجەڵ و ئیتردا. ڕوچوون، قوم بوون لەئاویدا یا دەنگی چوونەخوواری. ڕووت، قووت، سەڵت.

**قوڵتاندن:** قورتانن. بردنە ناو ئاو، ڕۆهێشتنە ناو ئاو.

**قوڵتـە:** جوورە دەنگێکـە لـەکاتی خوواردنـەوەی چـتی شـلدا لـە گـەرووی هـەندێ کەسا پـەیدا دەبێ. (ئـەردە.) چوونـە بن ئاوێیـە. دەنگی کولاّنـی ئاوێیە، قوڵپە، (هەورا.) قوڵ، لەناو دەفر و مەنجـەڵێدا، قڵتـە. (هەو.) نووکەباریکەکـەی هێلکەیـە، قووڵـە. ــ ی ڕانـی: ئەسـتوورایی ڕانـی. (دزە.) بـاڵندەیێکی گچکەیـە و بـۆرە لـە جێگایـانی سـەختی کێوانـدا هێلانـەی دروسـتدەکات و هێلانەکەش بنێشـتی قـایم دەکـات چـل ڕۆژان لەزستانێدا دەرناچێ. قوڵتـە شینکە، قورتـە، قورتـک، دەنگێکـە لـەژێر ئاوەوە بێتەدەرێ.

**قوڵتەباز** (خۆ.): فێڵباز.

**قوڵتەخۆرە:** ژێردەریایی.

**قوڵتەش:** بێ شەرم، ڕووداماڵراو.

**قوڵتەشە** (ئەردە.): قوڵتەش. ــ ی: بێ شەرمی، ڕووداماڵراوی.

**قوڵتەقوڵت:** فلقـەفلق، (بابا.) قوڵپـەقوڵپ، زڵقـە، زڵق. دەنگی کولاّنـی شلەمەنییە لەسەر ئاوری بە بێ پسانەوە. قڵتەقڵت. هەڵپەڕوداپەڕ.

**قولتەی ڕان:** ئەستوورایی ڕانی، مەشکەڕان، شلکەی ڕان.

**قوڵتخ:** بنهەنگڵ، بنەگڵ، بنەخڵ، بنکەش.

**قوڵتش** (ئەردە.): بێ شەرم، کوڵەش، ڕووش.

**قوڵتیان** (ئەردە.): چوونە ژێرئاو، قوم بوون.

**قوڵچـە:** قـول، دەسـک. ــ گیـاوگوڵ: دەسکەگیا یـا گـوڵ، پڕبەمسـتی، پڕ بەنێوانی قامکی گەورەوشادە.

**قوڵچماخ:** مەردومی قسەخۆشی، قسەڕەوان. هەرزە، قوڵنگی، قوڵدڕ.

**قوڵخ:** خانووێکی بچووکە لەسەر ڕێگادا دروستکرابێ بۆ ئەستاندنی خەرج و باج لە مەردوم.

**قوڵدان** (هەورا.): چڵدان، قوڵتیان.

**قوڵـدڕ** (ئـەردە.): مـەردومی بـێ شـەرمی بـێ ئـابڕوو، قوڵچمـاخ.

**قولدرێژ:** داهۆڵ، لاقدرێژ.

**قولزاندن** (باک.): قەدکردن، چەماندنەوە.

**قولزین:** قەدبوون، چەمانەوە.

**قوڵسان** (گەر.): کۆڵمک.

**قوڵغ:** خانوویکی گچکەیە لەسەر ڕێگایەدا دروست دەکرێ بۆ ئەستاندنی باج لەخەڵکی. جووان.

**قوڵف:** (هەورا.) دارکونێرە. (زا.) قڵف، دەسە، دەسک، هەنگڵی دیزەوگۆزەو نیتر، قوڵپ، چەپل، چەمل. جێگا دەستە لە هەموو چتێکیدا، کە پێی هەڵبگیرێ. قفل (قفلً). قوڵفی دوگمە.

**قوڵفە:** ئاڵقە، قافکە، قاف، قوڵف، قڵف. جوورە گرێدانێکە بە قوڵفە تا ئاسان بکرێتەوە، گرێ قوڵفە، قوڵفک. (ئەردە.) ئاڵقەیێکە دەنرێ لە هەموو چت. چەند ئاڵقەیێکە لە خێوەت و دەوار لە یەکتر هەڵدەپێکرێن.

**قوڵفەقوڵف:** دەسکی گۆزە و دیزە و چتی تر.

**قوڵفچادر:** قوڵفی چادرو خێوەت.

**قوڵف لێنان:** مەبەس لە سەنگین و گران ڕاگرتنی یەکێکییە، کە سەنگین و گران نەبێ. قڵف لێنان لەدیزەوگۆزە و نیتر.

**قولقولاندن:** جوورە یارییەکی دوودەستەییە قامکی لاقی چەپ لە پشتەوە دەگرن بەدەستی ڕاست لە پشتەوە وە لەسەرپێی چەپ بە هەنگڵە شەڵە دەچن بۆ یەکتری.

**قوڵقولانە** (ئەردە.): بالینە: قەلقەلانچکە، ئاڵقەیێکە لە کونە پەرژو لەسەر سەر دادەنرێ تا تەبەقەو چتی لەسەردانرێ.

**قوڵقولانچکە:** قولقولانە.

**قوڵقوڵە** (شن.): ئێسکی نێرومێی لەسەرەوەی ڕانی، (هەو.) نێک، ئەسکنجە، زیزەڵە. ناوی کانیەکییە، کە لە گوندی (بەیرەم) ی هەڵدەقوڵێ کەوتۆتە نێوانی وولاتی مەنگوڕو گەورکانەوە و دیبۆکرییە، یەکێکە لە دێهاتەکانی قازییان لەنزیک سابلاخی ڕەنگین. قوڵتەقوڵتی شلەمەنییە لەسەر ئاووری.

**قولک** (ئەردە.): دەخیلە، گۆزەڵەی پارە تێخستنێیە.

**قوڵقوڵە:** قەڵپەزە: فووارە.

**قولکرن** (زا.): کونکردن.

**قوللە:** تەرازن، (باک.) تیتالک، قیتکا سەر چیایە، تەپەلۆکی سەر کێوان، قاپ، قۆپ، کلاڤە، کەپک، کلۆپنک، کومبەر، کێلی، کمت. سەری چالاّیی هێلکە.

**قوللە:** کۆپ، کۆت، گووپک.

**قوللەی کێوی:** دهار، (باک.) پۆز.

**قولە** (ئەردە.): ووشترگەلوو.

**قولشت** (کە.): نیوچنک، نیوەمشت.

**قوڵنگ:** جوورە باڵندەیەکە لەگەڵ قازی پێکەوە گەرمێن و کوێستانێ دەکەن، لاق و ملی درێژە وەکوو شینە شاهۆی دەچێ. هەندێکیان دەمی خرو لووت درێژە، جوورە پاچێکی یەکدەم و دوو دەمیش هەیە خاکی پێ هەڵدەقەنن، دیواری پێ تێکدەدەن، قوڵینگ، کولنگ، کولینک، قوڵنگە. (جا.) دارێکە سەر دوو فلیقانە بۆ میوە لە لکە بەرزەکانی درەختان لێ کردنەوە، چەلاک، بازگە، قوتکە.

**قوڵنگە:** قوڵنک، پاچێکی یەکدەم و دوو دەمیشی هەیە بۆ خاک هەڵکەندن بەکاردەبرێت.

**قوڵنگەی فیلەوان:** فیل کوت، کەژە.

**قولۆچ** (باک.): شاخ، قۆچ.

**قولۆچ خشت:** شاخ ڕاست.

**قولۆچکێر:** شاخ چەماوەوە.

**قولۆر:** قوورژن، کلۆر، قلۆر، کاس.

**قولۆق:** کلکی گەنەشامی.

**قولووچ:** چاڵ و چووڵ و چرچی دەم و چاڵەقووتە، قولاّپی قەیسی و نیتر.

**قولووچان** (ئەردە.): جوورە یارییەکە.

**قوولووچ قوولووچ:** شووێنی چاڵ و چۆڵ.

**قوولوولوولوو:** چارشارکێ.

**قولێر** (بار.، باک.): سێوە لاسوورە. (باک.) کون. ـــ کرن: کونکردن.

**قولی:** کورتکراوەوەی موحەممەد قولی یا جەعفەر قولییە.

**قولیان** (هەورا.): کولێن. (ئەردە.) کۆلان، کوڵیان.

**قولیچک:** قامکەچکۆڵە.

**قولیک** (زا.): بەندیخانە.

**قولی مست:** ناو بەری دەست بە قووچاوی.

**قوڵینە** (بابا.): قەرتاڵەیەکی قووڵە، سەوەتەیە کە لە شووڵکان دروستدەکرێ.

**قولینچک:** قوژبن، کەلێن، گۆشە، سووچ، قونج، کونجک. (هەورا.) هەڵقورینجاندن، قونجرکە لێگرتن.

**قولینچکدار:** سووچدار، گۆشەدار.

**قولینچکی چاو:** کورنیشک، قونکی چاو، (باد.) قۆزی چاڤ، بەولایە دەڵێن، کە کەوتۆتە لای گوێیانەوە.

**قوڵینگ:** باڵندەیێکی کێوییە مێردی قازییە و پێکەوە گەرمێن و کوێستانێ دەکەن. جوورە پاچێکە، (باک.) تەڤر، کوولانگ، زەنگەن. قوڵنگ: جوورە باڵندەیێکە.

**قوم:** قیپ، نقووم. ـــ بوون: ڕۆچوون، نقووم بوون، چۆم بوون، قیپ بوون. گولپ، قپ، مژ. ئەوەندە ناو یا شلەمەنییە، کە لە زار کرێ بۆ جارە قووتدانێکی، پڕ بە گووپ. ـــ یک: قرەک ئاف. ـــ یک لە ئاودان، یا لە جگەرەدان: قومێک ئاوخواردنەوە، پشووێک جگەرە هەڵمژین و جغارەکێشان. فر. ـــ یک ئاو: فرێک ئاو. زیخ، خیز، لیم. نێی ئاش. کۆل، نێ، دارێکی درێژە و ناو هوڵۆل وەکوو ئاخوڕ ئاوی تێدەکرێ بۆ خواردنەوەی ئاژاڵ و هەم دەفرێکی گەورەیە بۆ ئاوی ئاژاڵان.

**قوماتە:** پارچە تنراوێکە مندالی تازەبووی پێ دەپێچرێتەوە.

**قوماتەکردن:** پێچانەوەی منداڵی ساوا بە تەنراوێکی لە مەرحەمە یا چتێکی تردا.

**قومار:** گەمەیێکی ئەنجام پیسە بۆ پارە لێک بردنەوە. لە ـــ ی دادڕاندن: واتە لەدەست چوون و زیانکردن. لە ـــ یدا بردنەوە: قازانج کردن. فروفێڵ. فشە، گاڵتە، یاری، کایە.

**قوماربـاز:** قومارچی، مەردومی فێڵباز. دەغەڵ، قەشقە، ناڕاست. ـــ ی: قومارچێتی. دەخڵی، قەسقەیی، ناڕاستی، فێڵبازی.

**قومارچێتی:** باری قوماربازی.

**قومارچی:** قومارکار، کەسێکە قوماری زۆر بکات.

**قومارخانە:** قومارگە.

**قومارکەر:** قومارکار.

**قومارکردن:** قومار لەسەر پارەکردن، خەریکی قوماری بوون.

**قوماش:** کوتاڵ، ناوی جۆگە ئاوێکییە لە شارەزوور.

**قومام:** جوورە گیایەکە لە گەڵاو ساقدا وەکوو گەنمە بەڵام گوڵەکەی دان ناگرێت شێوەی نییەو پووچە، سەلکەکەی شیرینچکە.

**قومامە:** قمامە، تەقەڵێکی گەورە ئەو دیوو ئەو دیوە، کە ناو بەناو لە دۆشەگ دەدرێ.

**قومان:** پارچە تەنراوێکی درێژە منداڵی تازەبووی پێ دەپێچرێتەوە.

**قوماند** (باک.): فەرمان، شەڕ، جەنگ.

**قوماندار** (باک.): فەرماندار، شەڕکەر، شەڕانی.

**قومەزە** (ئەردە.): زۆڵ، بیژوو.

**قومەقوم:** ڕەتم، کەین و بەین، (کە.) پچەپچ. دەنگی تونگەیە لەکاتی ئاوخوواردنەوەدا.

**قومەڵان:** خیزەڵان، زیخەڵان.

**قومپارە** (ئەردە.): گوللەتۆپێکە، کە ساچمەی زۆری تێدابێ، بۆمبا.

**قومپاژنە:** پانیە، پانێ، قومپانیە.

**قومپانێ:** پانیە.

**قومپانیە** (هەر.): قومپاژنە، پانیە، پانێ، پانیەی پێ ویا هی قۆندەرە.

**قومپوز:** لاف، فیز.

**قومڕخ** (ئەردە.): گورج، ئامادە.

**قومری:** باڵندەیێکە بەقەد کەوێکییە دەنگی خۆشە ڕەنگی پڕەنگ و پلپلییە، خەتێکی ڕەشی لە گەردنیدایە لەناو کوردەواریدا لایان وایە، کە دەخوێنێ دەڵێ (یاکەریم)، بە خێویش دەکرێ و زۆر نرخدارە بۆرکار و سەربالْ شینە، جوورە کۆترێکە و لە کۆتر گچکەترە. نێوی ئافرەتانە. داشکەلەم.

**قومساڵ** (کە.): خاکی لماوی، خیزەڵان.

**قومسی** (باک.): دوژمن.

**قومش** (ئەردە.): نەغەم، نوغم، لووغم، کارێز.

**قومش کەن:** کەسێکە نووغمی لێ بدا، کارێزکەن.

**قومقومە:** گومگومە، بزن مژ، بزن مژک، تێرتیرە. تونگە، بقبقە، لوولێنەی گلە جوورە گۆزەڵەیێکی ئارێیە زاری تەنگە قومقومە ناوی لێدێتە دەرێ، جوورە مارمێلکەیەکی نێومالانە مێشی دەخووا.

**قومقومۆک:** بزغشک، بزغژک، کمکمە، گیرنگرک، کمکیر، قۆری، (زەن.) قمقمۆک، قومقومک، خەمەگرور، ڕەنگی شینە. (زەن.) پیسپیسۆک، (کە.) قۆری، قمقمۆک، (زەن.) قومقومک، دەڵێن هەمووی سپیەو ڕەنگی تری نیە، (باک.) گیایەکە، قومقومە.

**قومقومۆکە:** قومقومۆک.

**قومقومە:** قومقومۆکە، دەفرێکی مسینی قوڵفداری مل باریکی بن پانە.

**قومقومۆکە:** ترترە، بزن مژک، بزن مژ، داعبایەکی گچکەی وەک مارمێلکەی وایە، گۆزەڵەیەکی مل باریکی بەرزە ناو ملەکەی کونکونە لەکاتی ئاولێ ڕۆکردنیدا بلقەبلقی لێوەدێ.

**قوملاخ:** قورێکی ملی ئەستوورە، کە پەیدا بووبێ لەباران یا لە ئاوی ترەوە.

**قوم لێدانێ:** بەستەییێکی بادینانییە.

**قومووش:** کونێکە بە ژێر زەویدا لێ بدرێ وەکوو کونی کارێز.

**قوم لێدان:** ئەفسێک لە جغارەو سبیلەو ئیتر دان، وەرگرتن و هەڵمژینی چتی شل، مژین.

**قومووش لێدان:** قوم لێدان، هەڵکەندنی قومووش لە زەوی بە یەخەدرێ.

**قونار:** لق و پۆپی بن بەری داران. ـــ کردن، (خۆ.) قونیر، لێکردنەوەی لق وپۆپی دارەمێوییە بۆ ئەوەی لقەکانی ناوەڕاستی بەهێز بن و بەریش زۆر بگرن.

**قۆناغە:** بابۆڵە، پێچانەوەی منداڵی ساوا.

**قونارغ:** قۆنداغەی تفەنگ.

**قونانیشک** (جا.): ئانیشک.

**قونە** (بابا.): هەڵبەز، ڕۆییشتن و بازدانی هەندێ پەلەوەر وەکوو چۆلەکەو پاساری قشقەرە بەهەنگاو، کەو.

**قونەت** (ڕەوا.): خۆهەڵکێشان.

**قوننەت** (کە.): کوندە، قوندە، مەلی کلک کورت.

**قوننە** (کە.): شانازی، بەخ. ـــ کردن: شانازی و بەخ کردن.

**قونەقون** (بابا.): هەڵبەزهەڵبەز. بە ـــ ڕۆییشتن: بە هەڵبەزهەڵبەز ڕۆییشتن، هەڵبەزهەڵبەزێکە یەک لەدووای یەکتری.

**قونەنیشک:** ئانیشک.

**قونتاخ:** قونداغی تفەنگ.

**قونتار:** بنار، دامێنی چیا، پێ دەشت. *

**قونتک** (زا.): یاپراغ، دۆڵمە.

**قونج:** کونج.

**قونجرکە** (هەر.): هەڵقورینجاندن، قورینجاندن، قونجرک. پێکوڵی، گیایەکی بێ گوڵە، (شا.) کونجرە، پەیکول، پێکوڵ، گیایەکە قولانجێک بلند دەبێ دووای ووشکی جوورە دەنکێکی درواوی دەردەکات بەقەد نۆکێکی درێژکۆڵەیە.

**قونجریسکە:** برکە گیایەکە بە زەویدا توولە داوێ، هەر لکەی بە دوورو درێژی گەڵای ووردی پێوەیە گەڵایەکەی وەهی قورینگانێ دەچێ هەر لکەی چەند گوڵێکی سپی وشێن دێنێ و هەر گوڵەی ٢ قەلیان دێنێ، لەپاش ووشک بوونی لەجێگای گوڵەکان جوورە تۆوێکی بەقەد نۆکێکی دێنێ، چووار دڕووی تیژی پێوەیە بە هەر ڕوویەکی بە زەویدا بکەوێ ڕووەکەی سەرەوەی دوو دڕووی تیژی پێوەیە و سەریان لە هەوایە.

**قونجی** (ڕەوا.): کونجی.

**قونچرک:** قونجرک، چرنووک، نقورچ.

**قونچک:** کونج، قولێنچکی دیواری، قوونک، بنک، قوژبن. ـــ ی جغارە: بنک، بنکە. ـــ ی پیوازێ.

**قونچکی مێوژیومیوە:** دوریلک.

**قونچکە:** قنچکە. ـــ کردن: قنچکەکردن.

**قوندا** (زا.): قووندەر.

**قوندان:** (هـەو.) لای سمتی مریشکێیە دووای کوژرانەوە جالێنرابێ یا نا.

**قونـە:** قوننە، (کە.) قوڵـە، قوڵتـە، مـەلی کلک کورتـە یا بێ کلکـە، کووڵ، کوولی.

**قوندک:** کوولەکەی خواردنێیە.

**قونگ:** قوون.

**قوننە:** قوندە.

**قوننەت** (کە.): شانازی، پەخ. ـــ کردن: شانازی کردن.

**قونیک:** قولاپە، قولەپێ.

**قوو** (ئـەردە.): قوولـە، هـەرا، خولـوو، قـاڵ. بالّندەیێکی سـپی و تـووک نەرمە هێندەی دوو قـازان گەورەیـە ملیشـی بەقـەد ملی دووقـازان درێژە و بلندە، کەوی دەکرێ و گۆشتیشی دەخورێ و بالّندەیێکی دەریاییە.

**قوواڕەقوواڕە** (ڕەوا.): قرەقری بۆقانە.

**قوواش** (زا.): قوشقن.

**قووقوو** (ئەردە.): قاوەقاو، قوولـە، خولّوو، هەرا.

**قوویک:** بەرزییەکە لە ناوەڕاستی تەختانێکیدا. پشتی دەرپەڕیو.

**قووتـار** (خـۆ.): لێکردنـەوەی لـق و پۆپـەی دارە مێوییـە تـا لقـەکانی ناوەڕاستی بەهێزبن و بەری زۆر بگرن. (خۆ.) قونێر.

**قووت:** ڕووت، کۆت، خـوواس، هەمیشـە لـە دووای ڕووت بـەکاردەبرێ: ڕووتوقـووت. زاد، ڕۆزی، ئـەوەی مـرۆی پێـدەژی. لـووش. ـــ دان: پاروویێک یا قومێـک ئـاو یا چتێکی تر بە گەروودا ڕۆبردن. نقووم. ـــ کردن.

**قووتەرە:** بڕوانە: قۆتەرە.

**قووتە:** ڕووتە، ڕووتەڵ، (لەگەڵ ڕووت) ی نەبێ بەکارنابرێ وەکوو ڕووتەوقووتە. نقووم بوون. قوڵتە، خۆلە ئاو هەڵکێشان.

**قووتەڵ:** ڕووتەڵ.

**قووتەڵە:** ڕووتەڵە.

**قووتچوون:** چوونەخووارەوەی چتە بەناو چتێکی تردا، پارووەکە قووتچوو: قووتدرا، ڕۆ لە ناوەکەدا قووتچوو: ڕۆچوو.

**قووتـدان:** بردنـەخووارەوە بە گـەروودا کـردن، بـە گـەروودا ڕۆهێشـتن، بـە گەروودا بردنەخووارەوە، لرفدان، هشتاقتن، (کـە.) چۆقـدان، (بـاک.) دابەلیاندن. قووتدە: (باک.) داورە. پێ ـــ: داقورتاندن.

**قووتدەر:** قووتکەر.

**قووتکەر:** قووتدەر.

**قووتکردن:** قووتدان، نقووم کردن، لووش کردن، هەڵ لووشین.

**قووت ورووت:** ڕووت وقووت.

**قووتی** (زا.): قوتوو.

**قووج:** چتێکە لەوێنەی کەللەی شەکرێدابێ.

**قووچ** (بۆتا.): کەڵبـەرد. تەڵـەی داعبایان. قیت، بڵنـد، بـەرز، شـاخی بـەرز و درەخـتی بڵنـد. بالآبـەرز. (دزە.) یـەکێکی درێـژە، کـە کـورت بوویێتەوە.

**قووچان:** ـــ ی چاو: چاولێکنان، پێوەدران، چووقان، لێکنران، (هەورا.) قووچنای.

**قووچـاندن:** چووقـاندن بـۆ دەسـت و چـاوو دەم بـەکاردەبرێت، لێکنـان، مچاندن، نوکراندن.

**قووچانن:** قووچاندن، دەم نان بەیەکدا، لێکنان، پێکەوەنان.

**قووچاو:** دەم و چاو یا دەستی لێکنراو.

**قووچەک:** چەند چتێکە لەسەر یەکتریدا بنرێ بە قووچی.

**قووچەکە** (هەو.): قووچکە، (هەورا.) هەرە، پارچە زەوییەکە، کـەمێک قـووچ و قیـت بێـسا دەستکرد بێ یا خۆڕسک. (پـیر.) ئەنگوسـتیلەی دروومانێ.

**قووچکە:** قنج، قووچەکەی سەر دیوارو چیاو جێگایـانی بـەرز. ـــ ی قیت: بڵند، تەلاّقووچکە.

**قووچیان:** لێک دران، قوچلاندن.

**قووخ** (دەر.): کەپر، (هەورا.) هەرزەڵە.

**قووخەڵ** (دەر.): کووخ.

**قوورانـدن:** بۆڕەی ڕەشە ورلاّخ. هاوارکردنی سەگ و تاجی لەکاتی ئازار پێ گەیشتنیاندا.

**قوڕانن:** قووڕاندن.

**قـوورە:** دەنگێکی کـە لـە قووڕوسکە گـەورەتر بێ ـــ ی پێدەلێـن، دەنگی سەگێک و تاژییە، کە ئازاری پێگەیشتبێ. قۆڕە. بۆڕەی گایە.

**قوورەقـوور:** قـوورەی سـەگێکی ئـازار پێگەیشـتووە بـە بـێ پسـاندنەوە، تووڕەتووڕ.

**قوورت:** قۆرت.

**قووری:** خەرمانی شیشەتوتنانە. (لو.) چادان.

**قووڕی:** چادان. قۆڕیوون، وەتابا، گونزل بوون.

**قووری چەنگ** (باک.): هەڵقورینجاندن.

**قووزە:** قوورە.

**قووزەبەرد** (ئەردە.): قەمزە، گڵەوەرز، گڵەوەز.

**قووزەقووز:** قوورەقوور.

**قووس:** جوورە کولێرەیێکی بێ ڕۆنە.

**قووغەڵ** (دەر.): کۆخ.

**قووقە:** قایەخ دشەکەڤتی.

**قووقلاندن** (باک.): قرچ هەڵێنان (بۆ چەرم).

**قووقلین** (باک.): قرچ هەلاّتن (بۆ چەرم).

**قووقان:** دەنگی کەڵەبابییە کە دەقووقێنێ.

**قووقاندن:** خوڕێندنی کەڵەشێرە، بانگدانی کەڵەبابـە، دەنگی کەڵەبابییە کە دەقووقێنێ، قووڕاندنی کەڵەشێر.

**قووقانن:** قووقاندن، دەنگی کەڵەباب.

**قووقە** (کە.): دەنگی کەڵەبابییە، قیرە، کەدەخوێنێ.

**قووقەقووق** (کـە.): نووکی بـاریک و تیـژ. قیرەقـیری کەڵـەباب بـە بـێ برانەوە.

**قووقنای** (هەورا.): قووقاندن.

**قووقوو**: دەنگی کەڵەبابییە.

**قووکە** (کە.): نووکی باریک و تیژ.

**قووڵ**: کوور، چاڵ، قووڵ، سوتاڵ، سووتار، چەپکە گیا یا گوڵ. گۆم، بیرەچاڵ، قوولە، (باک.) مش، ناوێکە پەی نەدات.

**قووڵچی** (هەورا.): قالۆچە.

**قوولان**: پروانە: قولان.

**قووڵاندن**: قوولەکردن، بانگەوازی کەسێک لەدوورەوە: تێبی قوولاندن.

**قووڵانن**: قولاندن، قاوکردن، هەراکردن. بانگ کردن.

**قووڵایی**: قووڵی، چاڵی، چالاّیی، ناخ، نزمایی، نەرمایی، ئاستی قووڵی چت.

**قوولاقوول**: هەراهەرا، خولخولە، قاوەقاو، قولقولە.

**قوولە**: قاو، قاڵ، هەرا، قوو، قار، خولّە، قواقوو، خەلخەلە، کەپوورە، زلّە. (باک.) سوورخون (ڕەنگ) بۆ وولاّخی بەرزە. جووره دەنگێکی بەرزە درێژە مەردومی لە دوور پێ بانگ دەکرێ، ناوی دێیەکیشە لە ناوچەی سنگاودا. (هەر.) مەرێکە سەروملی سووربێ و لەشیشی سپی بێت.

**قوولەشکاندن**: کچێنی بردن، کچێنی لابردن.

**قوولەتین**: ئەندازەیێکە لەئاو کە چوویتە ناوی ڕەنگی تێک نەچێ و پیس نەبێ.

**قوولەقوول**: قیلەقیل، هەراهەرا، توولەی یەک لەدووای یەکتری. ـــ ی کەڵەبابی. ـــ ی سەگان.

**قوولەکردن**: قوولاندن: مەبەس لە پێ هەڵبڕینە لە بابەت هەموو کردارو گوفتارێکیدا.

**قوولەوهەرا** (ئەردە.): قیژەو هەراو هووریا.

**قوولەی کەڵەبابی**: قوقووی کەڵەبابی، بانگ دانی کەڵەباب.

**قوولـک**: دەخیلە، کوزەڵەی پارەتێخستنێ. (باک.) گیرفان، بەرک، بەری.

**قووڵک**: چاڵ و قووڵکەی گچکە.

**قووڵکە**: قۆقک، کورتک، کورت، قۆرت، چاڵ، زینی، کووانوو، کووانک، ئاگردان. چاڵێکە لە تەنیشت دۆڵیانی ئاشەوە ئاردەباری ئاشەوانی تێدەکرێت، قووڵک.

**قووڵکەستۆ**: چاڵی گەردنێ، تینی، چاڵ نینک.

**قوڵکەی شانێ**: (هەورا.) چەڵمە.

**قوولکەی گەردن**: قورگی هەورک.

**قووڵکردن**: کوور و قووڵ کردن.

**قووڵکردنەوە**: بە ووردی سەرنج دانە قسە یا چتێکی.

**قوڵۆقچی** (هەورا.): دورگمە.

**قووڵی**: قووڵایی، چاڵی، کووراهی، چالاّیی.

**قووڵینە**: سەرەتە، دەفرێکی شووڵێن قوولی زار ئاوەڵەیە.

**قوون**: قنـگ، کنـگ، پـل (مـەنگوڕی گـەرمێنی)، کـوون، عـن، عنـە، (هەورا.) قن، (ئەردە.) تن، کۆم. ـــ تێکردن: ڕوونەدان، پشت تێکردن.

**قوونار**: قونار. ـــ کردن: قونارکردن.

**قوونانیسک** (جا.): ئانیشک.

**قوونو** (هەو.): پاشاوێکە لەشیناوەردی پترپێ و لەبەری بروات.

**قوونوڵە**: (موک.، سەر.) گیایەکە لە دۆکوڵیوێ دەکرێ.

**قوونەبان**: قنگەبان، بناوان، کەسێکە مالّێ ڕەنێو بێنێ، قوویین بان. توانایی، دەستەلاّت، (باک.) قوونبان، قنگەبان. بێ ـــ: تەنبەڵ، تنگەبان. ژوورەوە و بنەبانی مالّێ.

**قوونەجووره** (ڕەوا.، خۆ.): نێوەڕاستی پشتییە تا قوونی مریشکی کوژراوەوەیە.

**قوونەخەو**: وەنەوزە.

**قوونەدەرز**: جووره درووماێکە وەکوو ماکینە وایە نێوانی تەقەڵەکان بەتاڵ نابێ.

**قوونەزەبرۆکە**: هێلکە.

**قوونەقوون**: کەو بە ـــ دەڕوات: بە هەڵبەزهەڵبەز دەڕوا، (بابا.) قنەقن، خاو، سست، تەمبەڵ. بە ـــ ڕۆییشتن: بە لۆقەلۆق وە سەر بەرزیان کەوتن.

**قوونەنیشک** (هەو.): ئانیشک.

**قوونەوتلوور**: خلۆر، قنگەوتلوور، خل، خول، خلۆر. ـــ بوونەوە: خلۆربوونەوە. ـــ کەوتن: درێژبوون، ڕاکشان. ـــ بوون: زیزبوون.

**قوونبان** (باک.): قوونەبان.

**قوونپانی**: پانیە، پاژنە، پانێ. (کۆ.) پاژنە، پانیە.

**قوون پێنی** (دەر.): پاژنە، پانیە.

**قوونجرک**: هەلقورینجاندن.

**قوونجلیسکە**: قونجرکە، پێکوڵە، پەیکوڵە.

**قوونجک**: قونچکی مێوژ و ترێ و جغارەو ئیتر، قینچک، بنک.

**قووندارغ** (باک.): وەکاز.

**قووندان** (هەو.): لای سمتی مریشکییە، سمتەسمتە جووڵەی مریشک و کەڵەشێر، جوڵە، قنگدان، دووای کوژرانەوەی سالێنرابێ یا نا. گاندان (بۆ نێرینانە).

**قووندانەوە**: دانیشتن.

**قووندەر**: قندەر، قنگدەر، حیز، کوونی، بڵح، پوشت، حیزێکی نێرینەیە. ـــ ی: حیزی، پوشتی.

**قووندەرز**: قولاپدووزی.

**قوونـدراو**: کەسێکە لەلایەن زۆر دارانەوە زۆری لە قوونی هەڵدرابێ. یا قوونی زۆردرابێ بۆ جنێویش بەکاردەبرێ. ـــ ی: تێهەڵدراوی، حیزی، بەناهومێدی.

**قوونفرە**: تەنبەڵ، خاو، سست، حیز. ـــ یی: تەنبەڵی، سستی.

**قوونک**: قونچک، ـــ ی خەنجەرێ.

**قوونکووانی**: مدبەق، تەنیشت ئاگردان و ئاوورگێ.

**قوونگران**: تەنبەڵ، سست. ـــ ی: تەنبەڵی، سستی.

**قوونگێ**: لۆتی کەسێکە هەر وە دووی هەتیوی سووک بکەوێ.

**قوون و هونەر:** ئازایی، هونەرمەندی، لە خۆڕادیتی. بە ــــ : ئازا، هونەرمەند. بێ ــــ : تەمبەڵ، خاو. دار یا گەز لەقوون براو.

**قوونەلەقەکێنە:** (هەورا.) قلیچکەهۆرتەکنێ، باڵندەییێکی چکۆڵەیە کلکی درێژە ڕەنگی شین و بەڵەکە، کلک و قوونی زۆر هەڵدەتەکێنێ.

**قوونەلکرێنە:** تیرەییێکە لە بڵباسەکانی بیتورێنی.

**قوونێر:** ئاشین، پیرۆڤ، ڕیشک، سوورەکوان، کوول، گرە، خەیارە، کەلە دەرو گردی قوون پەیدا دەبێ. (شا.) کنیر، کونێر، کوینێر، مووچ، پەتپەتۆک، (هەو.، کە.) دومەڵ، (سوور.) کوولێر، حەوتلۆ، کووان، کولەبا، کولکبا، تەقیژۆک. (کۆ.) تورلەییێکی مێوییە کە لە قەدی یا لە جێگای تر دەری دەکات دەیبڕن، خەڵفی بێ کەڵکی مێوی.

**قوولی:** قبوولی (چێشت).

**قوویخا:** کوێخا.

**قوویخایانە:** مووچەیە کە دەدرێ بە کوێخا.

**قوویت** (باک.): قووت، ژیان، زیندەگانی، خوراکێکە زیندەگانی دەپارێزی.

**قوویش** (باک.): بەرسینگەی زین.

**قوویل:** قووڵ، قۆڕ.

**قوویلە** (ئەردە.): قوولە.

**قووین:** قنگ.

**قووین بان** (باک.): قوونەبان.

**قێ** (بالە.): قاورمە.

**قێبەرووشک** (دەر.): قرپی توورهاتنەوە یا دووای چێشت و تێرخواردنێ.

**قێچ** (باد.): کێچ. (دەر.) چەپخێل.

**قێخا:** کوێخا، دوروشماڵ، گەورەی دێ.

**قێرە** (هەورا.): قۆڕ (بۆ گیانلەبەر)، گەدەروڵ، (ئەردە.) دەدە. قیرەقیری تەلەرەشەی. قرقری بۆق.

**قێرەقێر:** قارەقاری بێ پسانەوەی بۆق و تەلەرەشەی.

**قێرەیی** (هەورا.): قۆڕی (بۆ گیان لەبەران).

**قێز:** بێز، بێ ئیشتیایی، هەڵشیوانی دڵ لە چتێک.

**قێزە** (کۆ.): چەق.

**قێزەوون** (هەورا.): بێزبوونەوە، چتێکە دڵی لێ بشێوێتەوە.

**قێزبەل** (خۆ.): قیت و قۆز.

**قێزبەلە** (کە.، کۆ.، هەو.): گیایەکی بەهارییە و گوڵی سپیەو هی زەردیش دێنێ بەقەدیی حاجیلەی بنەکەی سەلکە و گەڵای وەهی ئەسپنگی دەچی ویا پنکی بەڵام پانترە بە خووێ و بە پاک کراوی دەخورێ سەلکەکەی بە دۆینەش لێدەنرێ بە کاڵیش دەخورێ. هەپلۆک، هەلاکوو، (دەر.) کەپەلووک.

**قێزبردن:** دڵبردن.

**قێزشێوانەوە:** دڵهەڵشیوان.

**قێزشێوییانەوە:** دڵهەڵشیوان.

**قێزکردنەوە:** دڵشێوان.

**قێلیچ** (بابا.): تیکوڵی گوێز و بادام و قەزوان.

**قیافە:** قەڵافەت، شێوە، دیمەن.

**قیبلە:** ڕووگە، کابە، ماڵی خوا.

**قیبلەنما:** جوورە کاتژمێرێکە لای نێوەڕۆیە نیشان دەدات، (ئەردە.) کابەنما، کەشتی وانانیش هەیانە.

**قیپ** (کە.): قوم، نقووم. ــــ بوون: نقووم بوون. ــــ خواردن: نقووم بوون.

**قیت** (زا.): ڕۆنێکە، کە بە دۆخە وەرگیرێ. قووچ، کێل، گیف، بڵند، قوت، زیت، ڕاست و بەرز، قنج، بڵندێکی ڕاست واژی کۆم. ــــ بوونەوە: قندربوونەوە، ڕاست بوونەوە، قوت و قیت بوونەوە. (چی.) لووک، پاق.

**قیتە** (ڕەوا.): کەسێکە زوو توورە بوویێ. چیچڵە.

**قیتەقیت کردن:** ملقوتکردنەوە و تەماشا کردنی یەک لەدووای یەکتری.

**قیتەڵ:** گیانداری قوتی پچکۆڵەی نەشمیلە.

**قیتەڵە:** قیتەڵ.

**قیتەقیت:** قوتەقوت، قنجەقنج.

**قیتەوەبوون:** قیت بوونەوە، ڕاست ڕاوەستان.

**قیتک** (زا.): قولی مرۆڤ.

**قیتکە** (کۆ.): قیتکایی لای پێشەوەی پێچی بووکان. میتکە، پارچە گۆشتێکی پترە لەناو ئەندامی شەرمی ئافرەتاندا. قیتکای سەری چیایان: کڵاوە، (خۆ.) بازگە، قووتکە، لووتکە، کەپک، کلۆیینگ، چیچڵە.

**قیتوفلفل:** کەڵک وکولووک، فرت وفێڵ.

**قیتی:** قوتی، بەرزی.

**قیجە** (فە.): قیژە.

**قیچ:** چەپخێل، چاو لە حەوا، کەسێکە چاوی لە حەوابێ، قنج، چاوقیچ. کێچ. (هەو.) کەم، تۆز، چک. ــــ یک: کەمێک ئاوم بدەیە. (باڵە.) کێچ.

**قیچە:** لەکاتی بانگ کردنێدا بەکاردەبرێ.

**قیچەک** (دزە.): کەمێ، نەختێ، چکێ.

**قیچەکۆکە** (دزە.): میچەک، کەمێ.

**قیچەوکردن:** چاوقیچ کردن.

**قیچک** (زا.): قیتک.

**قیچکرن** (باک.): ددان گرکردنەوە، ددان نیشاندان.

**قیچکردنەوە:** تەماشاکردن بە نیوە قووچاندنی چاوێک بۆ گاڵتە پێکردن.

**قیخا** (زا.): کوێخا، دوروشماڵ، گەورەدێ.

**قیدقید:** قدقد، قرتەقرتی مریشکان.

**قیر** (باک.): گازندە، گلەیی، قیرە. ــــ کرن: قیرە و هاوارو دادکردن.

**قیر** (هەو.، دۆڵە.): خڵتەی مۆدنە، ژاری سەبیلە. قیل، چتێکی ڕەشە لە کان و درز دەردێ بۆ ڕێگاوبان و زۆر چتی تر بەکاردەبرێت بۆ قیرەتاوکردن و بۆ زۆر مەبەسان بەکاردەبرێ.

**قیراخکردن** (زا.): خۆکۆکردنەوە و داوێن بەلادا کردن بۆ بە ڕێگادا ڕۆیشتن.

**قیران** (باک.): وێران، کاول. ـــ بوون: کاوول بوون.

**قیڕان**: قیڕە.

**قیڕاندن**: قیڕەکردن، قالاو. (باک.) تێکدان، کاوولکردن.

**قڕاندن**: تێکدان، کاولکردن. بە سەردا ـــ : شاتاوڕ. ـــ ی کەڵەباب: قووقاندن.

**قیڕانن**: قیڕاندن.

**قیڕە** (هەورا.): قیڕەقیڕ، دەنگی قەبەی بەرزی ناسازە. قووقە، گاڵ، قریشتە، دەنگی مریشک و کەڵەبابانە. قۆڕ. دەنگەدەنگ، گاڵەگاڵ، قیژە، (ئەردە.) قیرە، گلەیی، قیڕە، دەنگی مریشک و ئیتر.

**قیڕەبوون**: بڕێتیە لە دەنگ دەرنەهاتن لەبەر زۆر قیڕاندنێ، قۆڕبوون.

**قیڕەتاو**: قیڕتاو.

**قیڕەقیڕ**: قریشتەقریشت، شاتەشات، قووقەقووق، قیژەقیژ، دەنگەدەنگ، قرەقڕ، گاڵەگاڵ، گلەیی، (ڕۆژ.) بڵخاخ، قیڕەی یەک لە دووای یەکتری. ـــ ی منداڵ و بزنان. قاڕەقاڕ.

**قیڕەکەر**: کەسێکە بقیڕێنێ.

**قیڕەکردن**: قیڕاندن.

**قیڕەگون**: قۆڕ، گونزل یا کەسێکە لەبەر زۆر قیڕاندنێ قۆڕ بووبێ.

**قیڕپاچ**: قەمچی.

**قیڕبەقەرەس**: قیڕوسیا.

**قیڕبچم**: نەگریس، پیس، دەنی.

**قیڕپەکردن**: قرپەکردن.

**قیڕتاو**: قیڕەتاو، شوێنێکە یا چتێکە قیڕی تێ هەڵسووڕابێ. ـــ کردن: قیڕ لە چتێک هەڵسوون.

**قیڕتەبەق** (هەورا.): تەپڵەک، قەرتاڵە یا سەلەیەکە پێستی بەڕوودا گیرابێ و قیڕەتاو کرابێ.

**قیڕژە**: ڕەژووی بەردی.

**قیڕسیا**: قیڕوسیا.

**قیڕقاچ** (هەورا.): جوورە غارێکی وولاخانە، کە خووار بڕوات. وەرگەڕانەوەی سووارە بە هەموولایەکیدا لەکاتی تاوداندا بۆ تفەنگ تەقاندن.

**قیڕقەنە** (کۆ.): خڵتە.

**قیڕقیڕ**: قیڕەقیڕ.

**قیڕوسی**: قیڕوسیا.

**قیڕوسیا**: تخ، چش، قیڕوسی، بەکاردێنرێ لەکاتێکیدا، کە کارێکی گەند ڕووی دابێ و لێقەوماو ڕقی هەڵسابێ و لە ڕقان گووێی نەداتی و بڵێ.

**قیڕسیچم**: قیڕسیچمە، کەسێکە لە کاروباراندا لاسار و گیرو گرفت بێ.

**قیڕوقاچ**: قیڕقاچ.

**قیڕوهۆڕ**: قیڕەقیڕی زۆر.

**قیڕی**: چتێکە لە ڕەنگدا وەک قیڕی وابێ.

**قیڕین**: چتێکە لە قیڕی دروستکرابێ.

**قیز** (بابا.): بیر. (باک.) کچ، دۆت، کیژ. ـــ لەبنچینەدا لە (قیسە) وەیە لە پێش کوردان بە کچیان قیس کوتووە ترک لە کوردی وەرگرتووە. نیشانەی ڕەگ و ڕیشەی ئاوایە: قیسکەپیواز. ـــ خەیار. ـــ ترێزوو.

**قیزەوون** (ئەردە.): قێزەوون، دژخۆراک، دژخۆر. ـــ ی: دڵهەڵشێوێن، چرووک.

**قیزبەلە**: ئاڵەکۆک، نەپلۆک، هەلپۆک، هەپەلۆک.

**قیزبردن**: ئیشتیابردن.

**قیزشێویانەوە**: قیزکردنەوە.

**قیزنەبردن**: بێزنەهاتن.

**قیژ**: قیژە.

**قیژاندن**: گوڕاندن، هاوارکردن، نەڕاندن، چریکاندن، چڕین، وەدەنگ هاتن، ویقاندن، قیژەکردن.

**قیژانن**: قیژاندن، زریکاندن، چریکاندن.

**قیژە**: نەڕڕە، هاوار، گوڕە، چریکە، قیڕە، ویقە، کیژ، زریکە، دەنگێکی بەرزی باریکی ناسازی گیاندارە.

**قیژقەڵە**: قشقەڵە.

**قیژەقیژ**: هاوارهاوار، گوڕڕەگوڕ، نەڕڕەنەڕ، چریکەچریک، قیڕەقیڕ، ویقەویق، قیژەی یەک لەدووای یەکتری، ـــ ی ژنان.

**قیژەکردن**: قیژاندن.

**قیژنای** (هەورا.): قیژاندن.

**قیژۆک**: باڵندەییێکی سەوزە دەقیژێنێ.

**قیژووهۆڕ**: قیژەقیژی زۆر.

**قیژوهووڕ**: قیژو واژ.

**قیژوواژ**: قیژوهۆڕ، زریک وداک.

**قیژی**: (باد.) قیڕی، چریکە چریک، قیڕە.

**قیسپ** (ڕەوا.، خۆ.): شەقڵە، بەرچیغ، ڕکە، دارێکە بۆ تانۆکان دەچەقێنرێ هەر دارێکیش بەقەد وی بێ لەسەرەوەی دارە ڕایان دابنرێ هەر ـــ ی پێدەڵێن. (ئەردە.) قۆرت، چورتم.

**قیست**: توولەزەڕە.

**قیسکە**: کەخسە، کەخسک، قلیسک، قیسقە، قسکە، بەڕوولە، (کۆ.) خلیسکە، (شار.) خسکە، (کە.) قسقە، ووردە پیواز.

**قیسکەتەنگ** (هەو.): بێ چیکڵدانە.

**قیفار** (باک.): کارک، قیڤار.

**قیڤار** (باک.): کارگز، (زا.) گیایەکی دڕکاوییە کەر زۆری حەز لێدەکات.

**قیقال**: ڕەگێکە لە لەش بۆ هەندێ نەخۆشی خووێنی لێ بەر دەدرێ، ڕەگی دەم وچاو.

**قیقەی قووای قیقووی** (لو.): هەراهەرا، نەڕرەنەڕی پاڵەوانان.

**قیق بوون** (زا.): لاوازبوون.

**قیقۆ** (ڕەوا.): کاکڵەگوێزێکە بە کاکڵ دەربێ و ساخ بێت، (کۆ.) گاجووت.

**قیقی** (باک.): باڵندەییێکە پەڕی زەرد و کەسکە، دارکونکەرە.

**قیقی داوکە**: زیقارڵە.

**قیل** (باک.): کەڵپی سەگی. قیڕ. بێز، نیشتیا، مگێز.

**قیلاج** (باد.): قولانج.

**قیلەتاو**: قیرەتاو. ــ کردن: لە قەلاندۆش کردن.

**قیلەقاج** (کۆ.): قەڵاندۆش.

**قیلەقیل**: قوولەقوول، ــ ی کەڵەبابی.

**قیلکە** (ئەردە.): چیلکە، داری باریکی وورد. حیلکەی پێکەنینییە بەدەنگی بەرز.

**قیلکەقیلک**: حیلکەحیلکی پێکەنینییە بەدەنگی بڵند.

**قیل وقاج**: قناس، خوواروخێچ.

**قیلوومک** (زا.): کرژبوونی ئەندام.

**قیم** (باک.): دڵنیایی. ــ ا من پێ دێ: پشتم پێی قایمە، لێی دڵنیام.

**قیمە**: سیخمە، گۆشتی ئەنجراو، وورد هەنجراو. ــ کردن: سیخمەکێشان. دڵنیا.

**قیمەقیمە**: چتی ووردو خاش و ئەنجن ئەنجن کراو.

**قیمەکردن**: ئەنجینی گۆشت و کردنی بەقیمە.

**قیمەکوت**: قیمەکێش.

**قیمەکێش**: چەپەچاخ، جەخار، گۆشتکوت، ئاسنێکی دەمپانی تیژە گۆشتی پێ قیمەدەکرێ، گۆشت کوت.

**قین**: بە ــ : بەرق، رەقین، رق، رک، کین، کینە، پشم، مان، پرووشە، رق، دەغەز، دەخەز، کەرب، جەهر، حیرس. ــ هەستان: رق هەستان.

**قیناس**: قیل وقاج، خووارو خێچ.

**قیناوی**: رق ئەستوور.

**قین ئەستوور**: کەسێکە رقی زۆر هەستابێ و درەنگ دابەرکێتەوە.

**قینەبەری**: رقەبەری.

**قینەجووین**: رق هەستان.

**قینەقینە**: رق هەڵستاندن، دیقەدیقە.

**قینەقینەدان**: قین هەڵستاندنی یەکێک.

**قینەکێشان**: رق کێشان.

**قینەوەهاتن**: رق هەستان.

**قینەوون**: رق ئەستوور، حیرسن، ئاڵۆز.

**قین جووان**: رق هەڵستان.

**قین جووانندن** (ئەردە.): رق هەڵستاندن.

**قینچکە**: قنچکە، زەک، زیپکە، (دەر.) دشپۆکە، (هەورا.) زەک. چینچکە، لەسەر ــ هەڵترووشکان واتە لەسەر لاقان هەڵترووشکان.

**قین خوواردنەوە**: رق خوواردنەوە، حیرس خوواردنەوە.

**قیندار**: کیندار. ــ ی: کینۆیی.

**قین کێشان**: رق هەڵگرتن لە یەکێک.

**قین لەدڵ**: قین لە زگ، رق ئەستوور.

**قین لەسک**: مەردومی قیناوی.

**قینوون** (ئەردە.): قیناوی.

**قین هەستان**: رق هەستان.

**قین هەستاندن**: رق هەستاندن.

**قین هەڵسان**: رق هەستان.

**قین هەڵساندن**: رق هەستاندن.

**قین هەڵگرتن**: رق هەڵگرتن.

# ک

**ک**: تیپێکی ئابێی کوردییە.

**کا**: (دەر.) کێ، گیای دەغڵی گێرەکراوو ووردکراوە. ــ ی کۆن بەباکردن. بکا: بەبارامی بڵێ زووکا: زووبکا. کاکە کورتەی (کاک) یە: کا ئەریان، کا کوردۆ. (هەو.) کووا، لەکوێیە.

**کائین** (زا.): کاوێژی ووشتر و ئاژاڵ و رەشەوڵاخانە.

**کاب** (باد.): میچ.

**کابان**: بناوان، ئافرەتێکە سەر پەرشتی ماڵێ بکات، قوونەبان، قووین بان، کەیبانوو، کەبانی، کەیوان، (کە.) کەیوانوو، (فە.) کەینوو. ــ ی: بناوانی، سەرپەرشتی کردنی ماڵ. ــ ی (باد.): میچێن، جگێن.

**کابە**: ماڵی خووا (کعبە) یە لەشاری مەککە لە نووێژاندا بسووڵمانان رووی تێدەکەن و لە پێش بسووڵمانەتیشدا بوتخانە بووە.

**کابرا**: کاک برا، جوامێر، جوانمێر، گۆرین، وانێک، هەرامە، جایێ، هین، کاربرا، بۆ بانگ هێشتنی مرۆڤێک بەکاردەبرێ، کە ناوی نەزانرێ یا لەو دەمەدا ناوی لەبیرکرابێ و یا نەتەوێ ناوی بەری. برادەر، دەستەبرا.

**کابرنج**: بەڵم، کای برنجی.

**کابووس**: شەوە، مۆتە، گابووس، خەونی پەرێشان. گرانی و قورسایییێکە لە خەوێدا دەکەوێتە سەرلەش، کە لەسەرپشت نووستبێ ئەویش هێزی راکێشەری زەوییە.

**کابینە**: دەفتەرخانە.

**کاپ** (شەم.): جگ.

**کاپان**: کەیوانوو، (ز.) رێگای تەسک و تەنگەبەر.

**کاپک** (زا.): پارچەگوریس. (باک.) قەپیلکەی گەنم و جۆیە.

**کاپۆخ**: کەسێکە بەکرێ گیرابێ بۆکۆکردنەوەی گیای درووێنەکراو و کردنی بەخەرمان بۆ گزرە.

**کاپۆڵ** (باک.): قوری سوواخێیە. (ئەردە.) کەڵلەسەر، کاسەی سەر.

**کاپۆڵ**: کایەکە زۆر وورد بووبێ و خۆڵیشی تێکەڵ بووبێ. (ئەردە.) کەپۆ، لووت.

**کاپۆلک** (ئەردە.): کاپۆڵ.

**کاپێچ:** ژانێکە لەمزۆر خواردنی کاوە تووشی ئاژاڵ دەبێ.

**کاپێشکی** (باک.): کاڤیشکی.

**کاپێل** (ڕەوا.): قاپێلک و کاژەڵەی سەرە، کاسەی سەر، کەللەسەر.

**کات** (ئەردە.): تووتیای شین، تووتیا کەوڵە. دەم، چاخ، گاف، تاڤەتاف، زووم، قاس، (گەر.، باد.، ڕەوا.) بێن، (باد.) بافت، تاف، هەرەت، گاو، (باک.) چاخک، چاخ، پێل، گات، سەردەم، حەل، جەمگە، هەرەت، تاو، سات. لەکاتی: ژێلی، لەدەمی، وەتی، لەوەتی. ــ بوون: پێکران، لەدەست هاتن، پەرژان، لەهیچ ــ یکی: (هەو.) لەهیچ دەمێکیدا. دەغڵێکە دووای چێنرانی لەوساڵیدا بە بێ بارانەی شین نەبووبێ، بەڵام لەساڵی دوواییدا بە هۆی بارانەوە شین بووبێت و هاتبێتە بەرهەم.

**کاتار** (زا.): پۆپەی کەڵەشێر.

**کاتە** (باد.): وەچ. دەغڵێکە بەبێ چاندن لە شوێنی پار شین بووبێتەوە. (ئەردە.) گورگ.

**کاتەوار** (کۆ.): شوێنەوار.

**کاتب** (باک.): گوڵی داران.

**کاتبێژ:** کەژمێر، کاتژمێر، دەمژمێر.

**کاتژمێر:** دەمژمێر، (هەورا.) دەمژمار.

**کاتژمێری دیواری:** کەژمێرێکی گەورەیە بە دیواریدا هەڵدەواسن.

**کاتی:** گیایەکە ڕیشەکەی بۆ ژانەزگ زۆرباشە.

**کاتێکی:** دەمێکی.

**کاتی:** دەمی، هنگا. ــ بوون: دەمی بوون.

**کاج:** چام، مەرخ.

**کاجۆ:** کای جۆیە.

**کاجیرە:** شەویلکە، شەویلگە، لاجانگ.

**کاچ:** ڕەمەن، بن کاچ، ئەو شوێنەیە لەبن کەند و ناو ئاودا لە زستانانەدا ماسی تێیدامۆڵ دەخۆن و دەحاوێنەوە.

**کاچانی** (باک.): پیاڵەی شووشەی ساختەیە.

**کاچک** (باک.): کلکی کورت و بێتووکە.

**کاچێر:** شەویلکە.

**کاچێرە:** شەویلاک.

**کاخ:** کۆشک.

**کاخلی:** گیایەکی بەهاری و بەرزە گوڵێکی زەرد دەردەکات لە ڕووی گاڵگاڵی دەدرێ بۆ زەردی و جووانی.

**کاد:** نوسەیبین (نصیبین)، زەوی، عارد.

**کادان:** کادێن، جێگای کاتێکردنێ، کایەن، کادێن، لۆدە، لەوەدە، ژوور یا جێگایەکی تایبەتیە، کەکای تێکرێ.

**کادانە** (باک.): بارگین، بارگیر.

**کادە** (باد.، باک.): کولیچە، کەلانە، نێوساجی

**کادەفرۆش** (باک.): نێوساجی فرۆش. ــ ی: نێوساجی فرۆشی.

**کادز:** شەقامی کاکەشان لە ئاسمانێ.

**کادس** (باک.): کاکەشان

**کادوو** (بار.): دووکەڵی کا.

**کادێن:** کادان، کێدان، لۆدە، کارین، کاڵێن، کایەن.

**کادی** (سوور.، باد.، بار.): دووکەڵ، کادوو.

**کادی مێش** (باک.): خەڵفی مێش هەنگوینی.

**کادێن** (زا.): کادان.

**کادێنی مێشی:** کۆخی تایبەتییە، کە پوورەی مێشەنگوینی تێدا دادەنرێت.

**کار:** (هەورا.) هەرمان، کردار، پیشە، ڕەفتار، فرمان، پان، کەد، ئیش، کردەوە، کردە. بەکاربردن: بەکارهێنان، ڕەنێوهێنان. ــ پێکردن: خەپتاندن. بەکار: کارگەر، بەدەست و دوو، مەردەکار. لەکارکەوتن: لەگل کەوتن، لەهێزکەوتن. وەکارخستن: خستنەوەکار. بەکارهێنان: بەکاربردن، ڕەنێوهێنان. کاریلە، کارژۆڵە، کارژیلە، بێچووی بزنانە تا دوو سێ مانگان، گیسک. هەتەر، هێزی بینایی. چاوم ــ ی لێناکات: چاوم هەتەری لێناکات. (باک.) قازانج، سوود. بە دووای هەر ووشەیێکەوە بنووسێ دەیکاتە بکەر وەکوو: بەکار، سەرکار، کرێکار. (هەر.) بزنێکە گوێچکەکانی و لاجانگی سوور و لەشی و سەری ڕەشبێ. (باک.) ئامادە: من کارا لاوی خووە کریە. ــ ا خوەکرن: خۆئامادەکردن.

**کارئاشنا:** شارەزای کار، کارزان.

**کاراک** (زا.): کانی ئاسن.

**کارامە:** کارزان، مرۆی لێهاتوو و شارەزا.

**کارامەد:** کارامە.

**کارامەیی:** وورییایی، ئامادەیی یەکێک لە کارێکیدا.

**کارانە:** باجی کار. کرێکار.

**کارە** (کە.): کاریلە.

**کارەبـا:** زەردوویی، جوورە موورووێکی ڕەش و یا زەردە بۆپسپسۆک (تسبیح) وبەرموور دەست دەدەن و پووشی ڕادەکێشی، هێزێکیشە لە گەلێک چاتداهەیە بە مەرازی تایبەتی وەردەگیرێ ژووری پێ رووناک دەکرێ وەکوو چرا و ماکینەشی پێ دەخرێتەکار بە کاری هەزاران چت دێ. کارڤێن. کاروبا.

**کارەبایی:** بە ڕەنگی کارەبا. زەردی کاڵ و ڕۆشن.

**کارەدار:** پسپۆر. ــ ی: پسپۆری.

**کارەڕەهات:** پەرێشانی بەهۆی زۆرلێدان یا زۆر جنێودان یا زیان پێ گەیاندن یاسەرنانە سەرەوە.

**کارەسات:** چورتم، کارەڕەهات، رووشە، گۆنگەڵ، کارسات، فەتارەت، تاوێر، کۆلاو، هێل، هێلان، هەوان.

**کارەشین:** چەقالە، دارێکی کێوی بێ گەڵا و زۆر بەلق و پۆپەیە لە جیاتی چلوو و هەڵاش لەسەر داری دارە ڕایەی دادەنێن هەرسەربانێکی ئەوی تێدابێ نەسیسرەی دەبێ و نەناوور دەگرێ.

**کارەک:** کاڵەک، گندۆرە. جوورە پێلاوێکی وەکوو گێوە سەری بە ئاوریشمی ڕەنگامە چنراوە، بە زۆری ژنان لەپێی دەکەن.

**کارەکار** (باک.): گریان، لالانەوە. ــ ی (باک.): کارەکار.

**کارەکەر:** کلفەت، قەرەواش، ماهوکەنیز، کەنیزەک، بەرماڵی، (باک.) دەرماڵ، دایەن، کەنیش، سەرمەفرەشی.

**کارەکەو** (باک.): بارەکەو، (ز.) ڕاوکردن بە کۆمەڵ.

**کارەگا** (ئەردە.): کارگا.

**کارەما** (کە.): کارزان، کارئاشنا. کارەمێ، گیسکەمێ.

**کارەموو:** مووی کاریلان و گیسکان.

**کارەمێ:** گیسکەمێ، کاریلەی مێ، کارەما.

**کارەنێر:** گیسکەنێر، کاریلەی نێر.

**کارەوا:** کارەبا، زەردوویی.

**کارەوان** (هەورا.): کاروانچی. کاریلەوان، ساوەڵەوان، شوانی کار.

**کاربەدەس:** کاربەدەست.

**کاربەدەست:** کاربەدەس، بەدەستەڵات، مووچەخۆرە گەورەکان، کەسێکە لە کاروباراندا هەرخۆی حەڵبێ.

**کاربڕ** (ئەردە.): مەبەس لەیەکێکییە، کە کاروباری مەردوم ببڕێتەوە وەکوو قازی و حاکم.

**کاربڕا:** هاوکار، بەشدار، هاوڕێ، هاوبەش. ـــ یی: هاوکاری، بەشداری، هاوڕێیی، هاوبەشی.

**کاربین:** ووریا، بەکار، بەخۆوەژیو. زیرەک، زرنگ، کارپێکهێنەر. ـــ ی: ووریایی، بەکاری، بەخۆوەژیوی، زیرەکی، زرەنگی، کارپێکهێنان.

**کاربێچ** (زا.): شەن.

**کاربێ سپاردن:** کاربێ ئەسپاردن، کارئەسپاردن بەکەسێک.

**کاربێ سپێردراو:** کەسێکە کارێکی پێسپێردرابێ.

**کارت:** لەکەرت وەرگیراوە، ڕۆژاواییان لە کوردییان وەرگرتووە یان تێکڕاتییدا برابەشن، کوردان لە پێشدا بە پسولەیێکی گچکەیان کەرت گوتووە و (کارت) یش بەکارهێنراوە. سەوزاییێکە لە هی جاری پێشووی ڕووابێتەوە.

**کارتە** (هەو.): قەرسیلی پێش ماڵانە لە گوندانداا، کە هیشک بوو کارتەی پێدەڵێن و هەردەخلێکیش دوای ووشکبوونی شین بێتەوە کارتەی پێدەڵێن. (خۆ.) لکەتازەکانی دارانە، (باک.) شەفتالیم، شفک، لق، لک، کەد، شەخەڵ، چووزەڵەی دارێکییە، کەساوابێ یا گیایەکیە، بەڵان بۆ تووتن پتر بەکاردەبرێ، کە نەگەیشتبێ و هێشتا شین بێ، بەولکە گچکە و باریکانەش دەڵێن، کە لە بنەوەی داران یا لە کۆلکان دەری دەکات و ڕاست هەڵدەچێ. کاتە، وەچ، وەچە، کاردە.

**کارتک** (باک.): ڕێک و پێکی پرچ و کاکۆڵ. ـــ کردن: ڕێک و پێک کردنی پرچ و کاکۆڵ. (باک.) کەرتک، پارچە.

**کارتەوک** (باک.): جوورە گوڵێکی زەردە پێی دەڵێن (چاوەگا).

**کارتۆل** (باک.): کرتۆپە، پەتاتە، یارەڵماسی.

**کارتوو:** کەردوو.

**کارتێ:** هەسان، (کرما.) سووان.

**کارتێکەوتن:** کارپێبوون، ئاتاج بە چتێک یا کەسێک بوون.

**کارتێنە:** پەسپەسەکۆڵە.

**کارتینگ** (ئەردە.): کارتینگە.

**کارتینگە** (ئەردە.): جاڵجاڵوکە، پەسپەسەکۆڵە.

**کارتیخ:** بڕەند.

**کارتیس** (باد.): گیایەکە ئاژاڵ بیخوا پێی دەمرێ.

**کارتیغ:** کارتیخ، بڕەند، (باک.) کارتیک، جوورە بڕەندێکی وورده.

**کارتیک** (باک.): کارتیخ.

**کارتێنە** (ئەردە.): پەسپەسەکۆڵە.

**کارتێنک:** پەسپەسەکۆڵە، کارتێنە، مێشەگیرە، جاڵجاڵوکە.

**کارجف** (باک.): داو و دەزگەی هاوبەشی لە بازرگانیدا.★

**کارچف:** هەرمێ.

**کارچک** (باک.): هەرمی، هەرمێ.

**کارچن ڕەشک** (باک.): جوورە میوەیێکە.

**کارچین:** جوورە هەرمێیەکی زۆرخۆشە.

**کارخانە:** کارگە، دەزگا، دەستگا، جێگای کەل و پەل لێدروستکردن. بۆ بەدناوی بەقاحپەخانەش دەڵێن. ـــ چی: ئەوکەسەیە کارخانەی هەڵدەسووڕێنێ. بۆ بەدناوی بۆ ئەوکەسەش بەکاردەبرێ، کە چەند قاحپەیەکی ڕاگرتبێ.

**کارخانەی کاشی سازی:** کارگەی کاشی دروستکردنێ.

**کارخستن:** وەکارخستن، بەڕێکردن. پەکی کارخستن، لەکارکردن.

**کارد:** کێرد، چەقۆی گەورە.

**کاردار** (موک.): خاوەندفەرمان، ڕەنجبەر. ـــ ی: ڕەنجبەری. تیرەیەکە لەنەتەوەی ئێخسیری کورد لەنێو شکاکاندا.

**کاردانە** (خۆ.): پزدانی بزنییە.

**کاردانەوە:** بەکار بەربەرەکانی کردن، کردار یا ئاخۆتنێکە، کەلەیەکێکەوە ڕوویدا لە وەڵام یاکرداری یەکێکی تردا.

**کاردە:** پیواز یا کەوەر و نیترە، کە لەبنی پاری شین بێتەوە، (هەورا.) کارتە.

**کاردەپەل** (ئەردە.): تەرنە ئەبابیلە.

**کاردەپەلە:** تەرنە ئەبابیلە باڵندەییێکە. زبر بوونی لەش لەسەرمان.

**کاردەوەزە** (هەورا.): کاردەوەژە.

**کاردەوەژە** (هەورا.): کاکڵی گوێزی فەریکە، هەڵکۆڵینی چت بە چەقۆ، مەبەس لە مل و مووش و زۆر خواردن لە چتێک، ئەمەندە ـــ مەکە لەم خواردنە.

**کاردبەزشک:** نژدار. ـــ ی: نژداری.

**کاردروست:** کەسێکی ژیرو ووردتێبینە. ـــ ی: ژیری و وورد تێبینی.

**کاردک** (کە.): کاردوو، گیایەکی بەهارییە.

**کاردۆخی:** نێوی هۆزێکی کوردە.

**کاردۆژە** (ئەردە.): کاردەوەژە.

**کاردۆست:** کارپێخۆش.

**کاردۆک:** نێوێکی کۆنی کوردە.

**کاردوو:** کاردک، (جا.) هاز، گیایەکی بەهاری لاسک درێژی هەیە بە کاڵی تاڵە وتیژ و بڕندەیە بەزەردکرانێ باشدەبێ. بڕوانە: کاردی.

**کاردووەڕەشە:** جوورە کاردووێکی گەلاپانە دەکرێتە دۆڵمە.

**کاردوپەنیر:** مەبەس لە دوو چتی وایە، کە هەرگیز کۆنەبنەوە وەکوو دوژمنان.

**کاردووەکوڕانە:** جوورە کاردروێکە.

**کاردووەکووێ بەرپشوڵە:** ڕیشوڵە یا تورینە گەلاّی بە ووردی بەسەر هەربرینێکی وولاّخاندا بکرێت چاکی دەکاتەوە.

**کاردووەمارانە:** جوورە کاردروێکە ناخورێ.

**کارد و خەنجەر:** (ئەردە.) دەشنە.

**کاردی:** (جا.) کاردرو، هاز، (دەر.) کاردک، (باد.) کاری، جوورە گیایەکی تیژە بەسماقی خۆشدەکرێ جابەچەند جوورێک لێدەنرێ. ــ چەند جوورە. ــ ڕیخنە دەخورێ و بۆ ڕەوانی باشە. ــ ڕیشوڵە دەخورێ و بۆ ڕەوانی باشە. ــ شاخی. پرچنە. هەمویان دەخورێن، بەلاّن ــ ڕیخنە لەوانی تر خۆشترە.

**کاردیەڕیخنە:** جوورێکە لە چەشنەکانی کاردروان دەخورێ و بۆ ڕەوانیش باشە.

**کارزان:** کارامە، کارناشنا، (باک.) کارەدار، کارەما، ئیش زان، هونەرمەند، مەحلان، شاک، بەبرشت، بەجەوهەر، کارناس، بەرگەڕ، (باک.) جەرجەب، بەسەلیقە، ووریا، سەلیقەدار، چستە. ــ ی: سەلیقەداری، کارناسی، هونەر، جەوهەر.

**کارزۆرەکی:** بێگاری، سۆغرە.

**کارژ:** کاژ.

**کارژەڵە:** کارژۆڵە.

**کارژۆڵە:** ئاسک،مامز، کارژیلە، کاری ساوا. گیسکی چکۆڵە، کاریلە، کارژەڵە، کاری ساوای بزن، (هەورا.) بزڵە.

**کارژیلە:** کاریلە، کاری ساوا.

**کارسن** (زا.): هەرزن.

**کارساز:** چارەساز، چارەکار، کارپێکهێنەر، شارەزا. خودا، خودێ، خولاّ، خوا، یەزدان، ئێزەد. ــ ی: چارەسازی، چارەکاری، تەدارەک، ئامادە، کارپێکهێنان، کارشناسی. ــ کردن: تەدارەک کردن. خودایی، یەزدانی.

**کارسان:** کارستان، شار و ئاوایی و کارگە.

**کارفرۆت** (باک.): کارفرۆش.

**کارفرۆش** (باک.): فرۆشیار.

**کارفرۆشی:** فرۆشیاری.

**کارڤێن:** کارەبا.

**کارقایم:** کاربین، بەمشوور. ــ ی: کاربینی، بەمشووری.

**کارک** (باد.): کاڵ (بۆ میوە و تەرەکاری) نەگەییشتو، کارگ.

**کارک** (باک.): کاریلە، کارژەڵە. کارگ. (باک.) خانوو، دووکان، سنوور، دیاری کردن.

**کارکەر:** کارگەر، ڕەنجبەر، کرێکار، دەستەبەرە، دەستەوەرە. ــ ی: کارگەری، ڕەنجبەری، کرێکاری.

**کارکەرێتی:** ڕەنجبەرێتی.

**کارکەردە:** کارکردە.

**کارکەری:** ڕەنجبەری.

**کارکەنار:** کەسێکە لەکار دوورخرابێتەوە. ــ ی: دوورخرانەوە لەکار.

**کارکراس:** کراسی کاریّ

**کارکردە:** کارکەرە، کەسێکە لەپیشەیەکدا شارەزابێ و ڕاهاتبێ.

**کارکردن:** جێگیربوونی قسەیەک لەدلاّ، قسەی پیاوی چاک و ڕاست کاردەکا. دەرمان یا خواردنێک لەلەشی بەچاکی کاردەکات و ڕەوان دەبێ. فەرمانکردن، ئیشکردن.

**کارگ:** (هەورا.) هەڵێچ، هەڵچی، هەڵچک، (کە.) خارچک، (سن.) قاچک، کاکفلک، کاری، کفکار، کارک، قارچک، قارچ، قیفاز، قیڤاز، کومکاهاچی، باجیکۆکا. کارگ زۆر جووری هەیە: کارگەنەلز، کارگەسپیندار، کارگە بەرسوورە، کارگە پەینە، کارگە چینی، کارگەخۆڵ، کارگەخوێرک، کارگی دارەبی، کارگەکەرکۆڵ، کارگەکەما، کارگەکوێستانی، کارگەگولە، کارگەمێرگە، کارگەی دەشتان: دژمەلاّن.

**کارگا:** کارخانە، جێگای کارکردن، کارگە، کارەگا.

کارگا

**کارگای جۆلاّیی:** کارگەی جۆلاّیی.

**کارگە:** کارخانەی پیشەسازی.

**کارگەچی:** خاوەند یا بەڕێوەبەری کارخانە. بەو کەسەش دەڵێن، کە لباد و فەرەجی و چتی وا لە خوری دروست بکات.

**کارگەنەلز:** کارگەکەرکۆڵ، جوورە کارگێکن لە هەموان باشترن و دەخورێن، لە کۆلکی هەرکامێک لەو دروانە هەڵتۆقی لە هەموان باشترن.

**کارگەبەرسوورە:** جوورە کارگێکە دەخورێ.

**کارگەپەینە:** کارگێکە لە جێگای پیس دەڕوێ ڕەنگی ڕەشە ناخورێ.

**کارگە تاڵینتۆز:** جوورە کارگێکە لە کۆلکی تاڵینتۆزی بەهاران هەڵدەتۆقێ و دەخورێ.

**کارگەچێتی:** پیشەی کارگەیی.

**کارگەخوێرک:** کارگێکە لە کۆلکی خوێرگی هەڵدەتۆقێ و دەخورێ.

**کارگەر:** کارکەر، کەسێکیشە لە کارگەدا کاربکات. ــ ی: کارکەری.

**کارگەف:** کارگێکە وەکوو هێلکەیە دووای ووشکبوونی ناوەکەی وەکوو ئاردی گەڵوانی وایە، کەبە برینی مالاّتان وەرکرێ کرمیشی دەکوژێ و چاکیشی دەکاتەوە.

**کارگەکەرکۆڵ:** کارگەنەلز.

**کارگەکەما:** کارگێکە لە کۆلکی کەمایە بەهاران لە کوێستانان هەڵدەتۆقێ و دەخورێ.

**کارگەکوێستانی:** کارگی کوێستانیێ.

**کارگەگولە:** جوورەکارگێکە.

**کارگەمێرگە:** جوورەکارگێکە.

**کارگوزار:** کەسێکەکارێکی پێ ئەسپێررابێ و باشی بکات. ــ ی: کاربەکەسێک ئەسپاردن تا باشی بکات.

**کارماخ** (باد.): گیایەکی کێوییە ناخورێ. (زا.) بێژنگی گەورە.

**کارمامز:** کارژۆڵە، شەمکوێر، وەڵەد.

**کارمەزەل** (باک.): دەفتەرخانە، مێزی نووسینێ، ژووری نووسینێ.

**کارناس:** کارزان، کەسێکە لەباسێکی زانستیدا بکۆڵێتەوە.

**کارنساز:** دەوڵەمەند.

**کارنەساز:** هەژار. ــ ی: هەژاری.

**کارناسی:** کارزانی.

**کارنامە:** پرۆژە، بەرنامە، پەراوێکی تایبەتییە، کەکاروبارێکی تایبەتی تێدا بنووسرێ.

**کاروا:** کارەبا، کارەوا.

**کاروان:** کەروان، مەکار، چەند وولاخ و بار و کەسێکە لە شوێنێکەوە بچن بۆ شوێنێکی تر. ــ زۆرەوناپسێتەوە: مەبەس لە هاتووچۆیەکی بێ پسانەوەیە.

**کاروانە:** پەلەوەرێکە لە وێنەی مراوییە، بەڵام دندووک و لاقی درێژترە پێیەکانی وەکوو مراوی پەڕەدارە.

**کاروانەکردن:** زۆر هام و شۆی شوێنێکی کردن.

**کاروان ئاشی:** چێشتی پیازاو، هێلکە و شۆرباو.

**کاروانەوان:** کاروانچی.

**کاروانچێتی:** کاروانشانی.

**کاروانچی:** وولاخدار، مەکارەچی، خەربەندە، خەرەبەندە، کاروانکار، کاروانەوان، (باد.) خاوەندکاروان، کاروانی، (باک.) کاروانشانی.

**کاروانسەرا:** خان، قۆناخی کاروانی، کەرخان، تیمچە. ــ دار: خانچی. ــ داری: خانچێتی.

**کاروانشان:** کاروانچی. ــ ی (باک.): کاروانچێتی.

**کاروانقران:** کاروان کوژە، کەیوان، ئەستێرەیێکە کەزمێرێک پێش سپێدەی هەڵدێ.

**کاروانکار:** کاروانچی. ــ ی: ئەستێرەیەکی ئەوەندە پرشنگدارە دەڵێی گەلاوێژە، کەنیوەشەوهەڵدێ، ئەستێرەیەکی گەشە هێندێ جار زۆر لەپێش بەیانیدا هەڵدێ و کاروانچی بە ئەستێرەی بەیانی دەزانن و باردەکەن.

**کاروانکوژە:** (هەورا.) کاروانکوشە، دارێکی بێگەڵایە بەقەدەر پشتێندێکی درێژە و بەزەویدا بڵاودەبێتەوە بەتەری هیچ ناسووتێ گوایا چینە کاروانچییێک زۆریان هەوڵدا بۆیان نەسووتا تێکرا لەسەرمان مردن.

**کاروانکوشە** (هەورا.): کاروانکوژە.

**کاروانی** (هەورا.): کاروانچی، کەسێکەلەگەڵ کاروانی بێ.

**کاروبایی:** هێزی کارەبایی.

**کاروخ:** چیایەکە کەوتۆتە لای باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕەواندزێوە و بەهەندرێنەوە نووساوە گەرووی سەرایان لە نێواندایە و کەوتۆتە پشت هەندرێنی و زۆربڵندە. لێوار، کەنار، قەراخ.

**کاروش:** قاڕووش، کاڕووش، گیایەکە گوڵی وەکوو هەرزنییە بەژنێک پتر بڵنددەبێ ئاژاڵ دەیخوا تۆیەکەشی وەکوو جۆ دەدرێ بە ماڵاتان، گوڵی ڕێواسیش و هەر گیایەکی گوڵی وەوی بچێ پێی دەڵێن ــ هەڵێرک: گیایەکە لە ناو گۆڵ و دێراوی توتنێدا سەوزدەبێ مێملی توتنە و لەناوی دەبا، وووڵاخ بیخوا دەیتەقێنێ.

**کاروبا:** بڕوانە: کارەبا.

**کاروبار:** کار، فەرمان، ئیش و کار. ــ ا خۆکرن: خۆئامادەکردن.

**کارووت** (باک.): گێزەر.

**کاررووس:** گیایەکی بۆنخۆشە تێکەڵ بەهەندێک خواردن دەکرێت.

**کارووش:** کاڕووش.

**کارێز:** جۆگەیێکی ئاوییە، کەبەدرێژایی سەری داپۆشرابێ، چوخمە، قومووشێگە، (ئەردە.) قومش، کوورە.

**کارێزاو:** ئاوێکە لە کارێز بێتەدەرەوە.

**کارێزەکەن:** کارێزهەڵکەن.

**کارێزلێدان:** هەڵکەندنی کارێز.

**کارێ شەفرە:** کاریلەی ساوا.

**کارێل** (کە.): کاریلەکان.

**کاری:** کاریگەر، بەکار، بەتەزوو، کوژندە. کاردوو، کاردی.

**کاریت** (باک.): هەنگوین.

**کاریتە:** (کۆ.) تەژە، (بابا.) نیرگە، نێرگە، (کە.) ڕاجە، دیرەگ، (جا.، هەورا.) تەراح، (خۆ.) خسارە، (کە.) خسارە، نێڵەمل. کۆمر، پرد، گاریتە، دارێکی ئەستوورە بەنێوەڕاستی ژوورێکی دوورەچاوەدا ڕایەڵدەکرێ و دارەکانی دارەڕایەش سەرێکیان لەسەرەوە و سەرەکەی تریشیان دەخرێتە سەردیوار.

**کاریتەی پشتی:** تیلەقی پشتی، گارگاە، بڕبڕەی پشتی.

**کاریش** (باک.): کاڕووش، گیایەکە.

**کاریگ** (باک.): کاریلە.

**کاریگەر:** وەستایەکە، کە لەکاری خۆیدا شارەزا و ئیشکەربێ، دەرمانێکیشە لە جەستە کاربکات.

**کاریلە:** (باک.) کاریگ، (هەورا.) بزلە، بوزلە، کارژۆلە، کارە، (دەر.) کێری بزن، (فە.، کە.) دەنگی (ک) وەکوو دەنگی (کێ) وایە. ــ ساوا: کۆلەبژە، (باک.) کاری شەمزە.

**کاریلەی ساوا:** کاری ساوا.

**کاریلەوان:** بێچووەران، بێچقان، بەرخەوان، کارەوان.

**کارین** (باک.): توانین، شان، بکارە: بتوانە. (ڕەوا.) کادێن، کادان. (ڕەوا.) جێگای دانەرێڵەی سەوزە و داعبایانی دیکەیە لە زستانێدا.

**کازکازە** (هەورا.): دەنگی خۆش و ئاوازی ساز و سەمتووری.

**کازماڵۆکە** (هەو.): ئەو چیلکەیە، کە قەفانچەلەی پێدادەنێنەوە دان و داوی پێوەیە.

**کازیوە:** ڕووناکییێکە لە نێوانی شەوو ڕۆژێدا پەیدادەبێ، کازیوە، بەرەبەیان.

**کازیوە:** کازێوە، ڕووناکییێکە لەنێوانی شەو و ڕۆژێدا پەیدادەبێ.

**کاژ** (باد.، باک.): داری سنەوبەر بۆ خانووان دەستدەدا. (باد.، باک.) گلۆڵەی دەزوو و ئاوریشم. (کە.) تووێژ و کراسی مار، کیفەمار، تووێژی مار و پێست و ئیتر بە تووێژی گیانداری تریش دەڵێن.

**کاژاو** (بابا.): جوورە ترێیەکی بزمارکوتی مزرە.

**کاژاوە** (بابا.): جوورە ترێیەکە.

**کاژاوی:** جوورە ترێیەکی بزمارکوتی ڕەشی مزرە.

**کاژەڕە:** کاژەڵەی سەری.

**کاژەلاک:** کاژەڵە.

**کاژەڵە:** مێچی ئێسک و کەللەی سەرییە، (کۆ.) کاژێر، کاپێل. قالکامەژی.

**کاژک** (باک.): بنێشتی مستەکی.

**کاژۆڵە**: کاریلەی ساوا، کاریلە.

**کاژوماری** (هەورا.): کراسەمارانە.

**کاژێر** (کۆ.): کاژەڵە. دەلاقەی نێو دیوار.

**کاژێڕ** (دزە.، نەورۆ.): مەلاژگە.

**کاژێرە**: نەرماییێکەی سەر نێوچاوان، (موک.) کاکیلە، خلێنە. (بابا.) شەویلکە، خاڵیکە.

**کاژێڵە**: قاخڵی، سیاوڵە، ڕەشکەناونان، کاخڵی.

**کاژی**: توویژی ماری.

**کاژیلە**: کاریلە.

**کاس**: بێ هۆش، تاساو، تاس، گێژ، سەرسام، وڕ، دەبەنگ، سڕ، سڕەوە، کەسێکە لەبەرکاسی و وڕی دەنگ نەکا. (لو.) کولۆرو بۆش، چاڵ، قووڵ. (سەرگە.) شیشەی تفەنگێ.

**کاساڵەشینکە**: کەندەسمە.

**کاسان**: بێهەست وهۆشبوون.

**کاسە**: تاسی ئاو و خۆشاوو ئیتر، ئاوەخۆرە، بەرداغ، بەرتیل، کۆچیلەی ئاوێ. بادی، (باک.) بادین، کۆتک (بۆماستی) ولەدارە، کاسک، قاپ (هی چێشتێیە) تەبەک، کاسەی ئاوێ. (هەورا.) قاپ، ئامان.

**کاسەئاوسێ**: دوو دەراوسێن، کەناوبەناو چێشت بۆ یەکتری بنێرن.

**کاسەپشت**: ڕەقە، کیسەڵ.

**کاسەپشتی ئاوێ**: کیسەڵی ئاوێ. (فە.) ڕەقە.

**کاسەپشتی دەشتی** (فە.): کیسەڵ.

**کاسەچین**: سفرەچین. ـــ ی: سفرەچنینەوە.

**کاسەدەراوسێ**: کاسەسفرە.

**کاسەسەر**: کەللەی سەر، کەمێشکی مرۆڤی تێدایە.

**کاسەسڕ**: پەڕۆیەکە کاسە و قاپ و کەل و پەلی پێدەشۆن.

**کاسەسفرە**: کاسەدەراوسێ، شێوەوار چێشت ناردنە بۆ ماڵی دەراوسێیەکی تازە.

**کاسەسم**: قەپیلکێکی ڕەش و ڕەقە بە ژێری پێی یەکسم و ڕەشەوڵاخ و ئاژاڵانەوە، کەنەگۆشتە و نەئێسقانە.

.**کاسەشەن**: جوورێکە لە بێڵەدارینە بەڵام ئەم دەمی درێژە خەڵەی پێ ئەم دیو و ئەودیو دەکرێ.

**کاسەشۆر**: گیایەکی گەڵاپانی زبرە. کاسەسڕ.

**کاسەکەل**: کاسەشکاو، ئەشکەولەتێکە ئاوی تێدەکرێ بۆ مریشک و سەگ.

**کاسەگەردنێ**: کاسەگەرانن، جلانە.

**کاسەڵە** (موک.): ئەبڵەق، بەڵەک.

**کاسەڵەشینکە**: باڵندەیێکە بەقەد کۆترێکییە شین و کەسکە گۆشتیشی دەخورێ، (دەر.) چقەشینە، بەفرەشینە، بەدرەشینە.

**کاسەلێس**: ئەوسن، پاشماوەخۆر، ئەو کەسەیە قابان بلێسێتەوە. مەبەس لەمرۆی پاشماوەخۆرە. ـــ ی: پاشماوەخواردن.

**کاسەمەن**: جوورە دەفرێکە هەرچتی پێ دەپێورێ.

**کاسەوسەرەی** (هەورا.): کاسەی سەر.

**کاسەوکەوچکی شکاو**: ماڵی وێران و کاول.

**کاسەی ئەژنۆ**: چاڵایێکە لەسەر چۆک کاسەیێکی لە سەرە لاق و سمی پێ دەجوولێ.

**کاسەی چاو**: (هەورا.) کاسەوچەمی، کاسەی چەم، کالانی چاو.

**کاسەی چەم** (هەورا.): کاسەی چاو.

**کاسەوچەمی** (هەورا.): کاسەی چاو.

**کاسەوسەرەی** (هەورا.): کاسەی سەر، کەللە، کەللەی سەر.

**کاسەی خونچەی**: کاسەی شکۆفە.

**کاسەی ڕەش**: بۆکەسێک یا ماڵێک بەکار دەبرێ، کەشەوانە و بە تایبەتی لە جێژناندا بێ چێشت بێ.

**کاسەی زرێ**: کلاوەی سەر ئەژنۆیان.

**کاسەی سەر**: کەللەی سەر، قاقلۆک، کاپیل، کاژەڵە، قاپی سەری، (باد.) کولۆخ، کاژەڵەی سەری.

**کاسەی سم**: قاپیلکی سم.

**کاسەی سمت**: چاڵایێکە لە لای ڕاست و چەپی ئێسقانی سمتەوە، کەئێسقانی ڕانی تێدادەجوولێ.

**کاسەی گوڵ**: کاسەی گوڵان.

**کاسەی گوو**: کاسەی پیسایی.

**کاسەی گووێچکە**: کاسەی گووێ.

**کاسەی هەتیوان** (ئەردە.): کاسەی هەژاران.

**کاسەی هەژاران**: سفرەی هەژاران.

**کاسب**: کەسێکە خەریکی کەسب و کاربێ، پیشەوەر.

**کاس بوون**: تاسان، وڕبوون، گێژبوون.

**کاسبی**: کڕین و فرۆشتن، خەریکی کەسب و کار بوون، پیشەوەری.

**کاسک**: کەسک، سەوز، سەوزایی، شینایی، سەووز. (باک.) کەلەبامەی ئەژنۆ، کاسەی چۆک. کاسەی ئاو و چێشت و چتی تر.

**کاسکردن**: تاساندن، وڕکردن.

**کاسمە**: نانێکی تیرییە، کە ڕۆن کرابێتە هەویرەکەیەوە.

**کاسنی** (ئەردە.): گیای چەقچەقە.

**کاسۆ**: قاشۆ.

**کاسۆچەمی**: کاسەی چاو.

**کاسۆخ** (باک.): کاسووخ، تەوەرداس بۆ داربڕین.

**کاسووخ** (باک.): کاسۆخ.

**کاسوولی** (باک.): تەرکەخەمی. ـــ کرن: خستنە پشتگووێ، گووێ نەدان.

**کاسی**: وڕی، دەبەنگی، گێژی، گێجی.

**کاش**: شیشەی گۆشت برژاندنی، کێلانی زەوی، تەپۆڵکە. خۆزگە، بریا، بری بە بریای خوای بایە، کاشکی، خۆزی. (باک.) کێشان. ـــ کرن: وەدرەنگخستن، کێشان.

**کاشتە**: وەرزی، کشت و کێڵان.

**کاشتن**: کێڵان، وەردبڕین.

**کاشخانک** (باد.): بن میچ.

**کاشکانی**: پێڵاوی خلیسکێن، وەستای خلیسکێن. *

**کاشکای**: خۆزگای.

**کاشکایە**: خۆزگە.

**کاشکایەکوو**: خۆزگایەکی.

**کاشخانک**: بن میچ.

**کاشکایەکی**: کاشکی، کاشکایەکوو.

**کاشکای**: کاشکی، کاشکایە وەکوو.

**کاشکرن**: وەدرەنگ خستن، ڕاکێشانی چت لەبەرزیەوە بۆ نزمی.

**کاشکی**: خۆزگە، خۆزی، بریا.

**کاشمە** (باڵـە.): گیایەکـە دەخـورێ و دەکرێتـە نـاو پـەنیر و ژاژی و کەشکەوە، تام وبۆنی زۆرخۆشە.

**کاشۆ** (باک.): چەکوچی دووسەرە. (باک.) چەوگان، گۆچان.

**کاشوو** (باد.): دارێکە، کەیاری شەقێنی پێدەکرێ.

**کاشووانێ** (باد.): شەقێن.

**کاشی**: قابێکە لە قوڕی سوور سوورکرابێتەوە وتـەنک و جووانـە. خشـتی ڕەنگاوڕەنگی تـەنک و جـوان بـۆ لـەزەوی نێومـاڵ و هـەیوان و کۆشـکان بگیرێت.

**کاشی ساز**: کەسێکە کاشی دروست بکات.

**کاشێنە** (کۆ.): کووپەڵەی شینی ڕۆنییە.

**کاغەز**: قاقەز، نامە، نووسراو. ــ بەر: قاقەزبـەر. ــ دان: قاقـەزدان. ــ ڕۆشەن: قاقەزی شووشەیی.

**کاغەزساو**: چتێکی لووس و قورسە قاقەزی پێ لووسدەکرێ.

**کاغەزی شووشەیی**: قاقەزی ڕەوشەن.

**کاغەزهێن**: قاقەزهێن، هەڵگری نامە.

**کاف**: ناوی تیپێکی ئابێی کوردییە.

**کافرمان** (قەرە.): گوێزانی سەرتاشین و ئیتر.

**کافرۆش**: کەسێکە کای بفرۆشێ.

**کافک** (باک.): گۆزە کووپەڵە.

**کافوور**: جـوورە کەتیرەیێکـە لـە داری کـافوور وەردەگیرێت بۆنی خۆش و بەنرخە بۆگەلێ چت بەکار دەبرێت، گیایەکە گوڵەکەی شینە وەکوو دژبـرەی وایە بڵندنابێ بەتۆپ بەزەویدا پان دەبێتەوە بنەکـەی دەکرێتـە ئەسـپۆن و لـە هەموجوورە ئەسپۆنێکیتر باشترە.

**کاڤ** (باک.): ٢٥ی مانگی ئاب.

**کاڤار** (باک.): هەرێم.

**کاڤر** (باک.): کاوڕ، بەرخی یەکساڵییە.

**کاڤری** (باک.): ناوی جوورە هەنارێکییە.

**کاڤزێم** (باک.): کەف.

**کاڤشکی** (باک.): کابنشکی، لـەپێش کـاتی خۆیـدا زان، بەرخامـە ــ: لەپێش کاتی خۆیدا زاوە.

**کاڤل** (باک.): کاول، وێران، کەلاوە.

**کاڤلان** (باک.): کالان.

**کاڤێنان** (باک.): برژاندنەوەی برینان.

**کاک**: کەک، کـا، کـەی، کاکـە، (بـاک.) بـرای گـەورە، بـاچۆ، لـەشێوەی شێواز (ئـەدەب) دابـۆ هـەموو کـوڕو پیـاوێکی لـەخۆ گـەورەتر بـەکاردەبرێ بەتایبەتی بۆ برای گەورە و بابی جحێڵ. (هـەر.) لالـە. (باک.) سـەهۆڵ. کێک.

**کاکا** (باک.): جوورە میوەیێکە.

**کاکاو**: بادامی هێندی هاڕدراو وەکوو قاوە بەچاوە دەخورێتەوە.

**کاکە** (هەورا.): کاک، کا، ئابرا.

**کاکەرک** (باک.): کرکرۆچکەی کەپۆو گووێ و شووێنی تری لەشە.

**کاکەز** (ئەردە.): قاقەز.

**کاکەشان**: کەشکەشان، کـاکێش، کـادس، کاکەشین، کاکشـان، (بـار.) کاکێشان، ڕێگای کاکەشانە لە حەوادا شەوانە دەبینرێ سپی و پان دوور و درێژە، کە لە زۆری کۆبوونەوەی ئەستێراندا دیارە.

**کاکەشین**: کاکەشان.

**کاکەلێ**: برالە لە ڕووی خۆشەویستییەوە بەکاردەبرێ بۆمەردوم.

**کاکەیی**: خێڵێکی کوردە لە نزیک کەرکووکییە.

**کاکەمە**: یەکێکە لە دووازدە بەندەکانی، کەبـەگۆرانی دەکوترێن. نێـوی پیاوانیشە.

**کاکرسپی** (باک.): ڕیش سپی.

**کاکرۆس** (باک.): پاقلە.

**کاکرێ** (باک.): بۆڕی هەوا.

**کاکشان**: کاکەشان.

**کاکشن** (باک.): ئەو بەشە بەرسینگەیە، کەبێ تووکە.

**کاکشیر** (ئەردە.): قەلبیرە، قڕ، (ئەردە.) خنجکە، ڕۆیشتنێکە بە ناز و لار و لەنجەوە.

**کاکفلک** (باک.): کارگ.

**کاکل** (باک.): کاکۆڵ.

**کاکڵ**: ناوکی گووێزێکییە بەسـاخی لـە تێکوڵـەکەی بێتـەدەرێ، مـەغز، قیقۆ، (هەورا.) کاکڵە، مەژگە. برنج یا ساوارێکە لەگشت بەشـەکانی تر درشت تر بێ.

**کاکڵە**: ناوکی گووێزی پاکراو. برنجی کەڵەی پاکراو.

**کاکڵەی سینگی**: ئێسکەناسکەکەی خووار سینگییە، دندە.

**کاکڵەشێران**: یاری چاوشارکێ مندا ڵ دەبنە دوودەستە، دەستەیەک خۆی دەشارێتەوە دەستەکەی دووەم، کە بیاندۆزنەوە سوواریان دەبن.

**کاکڵەقووچە**: کاکڵەگوێز، کەبەخڕی بێتەدەرێ.

**کاکڵەمووشـان** (ئـەردە.): ئـەونی جاڵجاڵـوکەیـە، پەسپەسـەکۆڵە، (ئەردە.) جۆلایی کەرە. حەماموکی منـدالان هـەندێک خۆڵ دەکەنـە کۆمـا کەمکەمە ناوی بەسەردادەکەن تاسەرانسەرەکەی بەقەد قامکێکی دەبێتە

قوڕ دووایە لەسێ یا لە چووارلاوە کونی تێدەکەن و خۆڵەکەی دەردەدەن وەکوو گومبەزی لێدێ.

**کاکڵدار:** مەغزدار.

**کاکڵی گووێز:** ناوکە گوێز.

**کاکنج** (ئەردە.): بووکی پشت پەردە، کە زاوا هێشتا نەچووبێتە لای.

**کاکۆ** (کۆ.): کایەکە بەتەواوی لە دەخڵەکەی جووێ بووبێتەوە.

**کاکۆڵ:** فلکە، فەکڵە، کاکل، کوردیلە، کوودڵە، (هەورا.) خولامانە، خولامانێ، (زا.) پۆڕ، پەرچەمێکە بە پشتەسەری نێرینەندا شۆڕدەبێتەوە و بەقرتاوی هێڵرابێتەوە.

**کاکۆڵ مەل** (ئەردە.): فشەکلاونە، باڵندەیەکە.

**کاکۆڵ بە گوورووزە:** پۆرهەڵەک، کاکۆڵی بە گوریزە.

**کاکوچ:** چەکوچ.

کاکوچ

**کاکوچیل** (زا.): چێشتی ترخێنە.

**کاکێرک** (گۆ.): چەنەگە.

**کاکێژ** (ئەردە.): قەلبڕ.

**کاکێش:** کاکەشان، کسێکە کای بکێشێتەوە.

**کاکێشان:** کاکەشان، کێشانەوەی کا.

**کاکێ:** کاکە.

**کاکێ بە کاکێ:** بۆدەشتێک بە کاردەبرێ، کە پان و دوور و درێژبێ و چۆڵ و هۆڵ، بۆ ڕێگای دوور و درێژیش بەکاردەبرێ.

**کاکیلە** (موک.، هەورا.، جا.، هەو.): دیانکاکیلە چوارددان لەسەرێ و چوواریش لە خوارێ دوو دوو لە نێوانی خلێنە و دڕۆکی دان، شەویلکە، چەناگە، کاکولە. کاکەلێ.

**کاگەز** (ئەردە.): قاقەز.

**کاگڵ:** سوواخ، سوواغدان بە قوڕ، سوواغی قوڕ.

**کاڵ:** لە دووای (کشت) ە وە دێ وەکوو کشت و کاڵ. نەگەییشتوو، میوەی کاڵ و نەگەییشتوو، گۆشتی نەکولاو و نەبرژاو، خاو، تازێ، کاڵ و کرچ، کاڵک، نەگەهیشتی، تەهلک. ڕەنگی کاڵ: کەمرەنگ، ڕەنگێکە لەبەرهەتاو یا شووشتن و یا کۆنی تۆخێتی نەمابێ و ڕەنگی سووک هەڵگەڕابێ. (باک.) گەنج، لاو. (ئەردە.) کشت و کاڵ، وەرز، کاڵین، کێلان. ـــ ی کاڵ. ئاژاڵی زگ و زا نەکردوو. چاوی ـــ : نەرمشە و نەشین.

**کال** (باک.): ـــ بوون: پیرکردن، پیر، کال و کالک: بابوباپیران، خزم و خوێش، باپیر، خەم، پەرۆش، هەناسەی کال: هەناسەی پەرۆشاوی. (باد.) پیر، تەمەنێکە لەنێوانی پیری و جحێڵیدابێ. (باد.) بزنی نێوچاوان سپی. بزنی کال: بزنێکە لە دەم و چاویدا خەتی زەردهەبێ، بەبزنێکی ڕەشیش دەڵێن، کەگوێیەکانی زەردێکی قاوەیی بێت یا بنگوێی سوورو یا زەرد یاسپی بێ یا ناوچاوانی سووربێ و یاسپی. (باد.) نەگەییشتوو، کەرک، ناپوخت، (هەورا.) نەیارا. (باد.) کسێکە ڕەنگی سپی و جووان بێ. (باد.) کۆسە، بووکەبارانە. (باد.) داوەرە.

**کالا:** کاڵە، پێتاو، کالاو. کوتاڵ، (هەورا.) پارچە، والا، چتمەک، شتمەک، کەل و پەل. خشڵ، چەکی ئافرەتان.

**کالات** (ئەردە.): تالان، کالەت، کالتە. بە ـــ چوو: بەتالانچوو.

**کالاقنگ:** گەلای گیای ڕێواسی.

**کالاکوت:** کوتکی جل شوشتنێ، کلارکۆ.

**کالاکوتک:** کوتکی جلشوشتنێ.

**کالان:** (باک.) کاڤلان، (فە.) قلاف، (هەو.، هەورا.) کێلان.

**کالانە:** چالاییکە، کەگلێنەی چاوی تێدایە.

**کالاندن** (هەر.): بالاندن، (دەنگی مەڕییە)، پەزدکالێنێ. توورەکەییکی تەنکە، کەمێشکی تێدایە، تووربەی مێشکی.

**کالانۆک:** پێستی سەر.

**کالانی** (باک.): کێردی کالاندار.

**کالای** (هەورا.): کێلان.

**کالاور:** کاڵەپێتاو، پێلاوێکە لە چەرمی خاو دروستدەکرێ بۆ ناو بەفرو قوڕی زۆر.

**کاڵە:** کالک، شمک، (هەورا.) خامینی. کالا، لەچەرمی گاونێتر لەپێدەکرێ و بەبەن قایم دەکرێ.

**کاڵەبرۆێش:** برۆێشی گەنمی پەڵخوردکراو و نیوە هاڕدراوە و نیوە کولاو. جوورێکە لەتەرزە، کە وەکوو برۆێش ووردبێ.

**کاڵەپێ:** ئەندازەیەکە بۆ بارینی بەفر بەقەد ئەستوورایی کاڵەپێیەک بەفر.

**کاڵەپێچ:** پەڕۆیەکە لەپێوە دەئاڵێنرێ و کاڵەکەی لەسەرەوە لەپێدەکرێ.

**کاڵەت:** کالت، تالان.

**کاڵەشێف:** زەوییەکە کێڵرابێ و لەپاش کێلانی باران لێی نەدابێ.

**کاڵەشین** (کور.): (هەو.) چەقالە، شوالەشین، شوالشیلک. (کە.) بایەف، داری چەقالەیە و بەبەرەکەشی دەڵێن وایم.

**کاڵەک** (باک.): کەلەکە، کەلەگە، خزم و خوێش.

**کاڵەک:** (هەو.) گندۆرە، گوندۆرە، خەرووزە، (لو.) خەرویزە، کالک، جوورە تەرەکارێکی هاوینییە جووری زۆرە قەرەوی = قەرەیی، فاتەبۆرە، ئالتی ئای، هەرچەمە بەتۆو دەچێنرێ گەلای پانە و تەرزی بەسەر زەویدا دەڕوا وەکوو شووتی و خەیارو ترێزوو. کاڵەکی نەگەیشتوو، زرک، کالک، کۆڵە.

**کاڵەکاڵ:** بارەباری مەڕانە لە کاتێکیدا، کەبەرخەکەیان ببینن.

**کاڵەکەرشتی** (خۆ.): کاڵەیێکە لە چەرمی گامێشی دروستدەکرێ.

**کاڵەکەشامی** (موک.): جوورە کاڵەکێکی درێژۆکەیە.

**کاڵەکە گا** (خۆ.): کاڵەی چەرمی گایە.

**کاڵەکەمارانە:** گوورژاڵک، کەکرە، خەیاری دێمی، گیایەکی دێمییە و دوو چەشنە یەکێکیان وەکوو مێو تەرز داوێ بەرێکی خردەگرێ و دەخورێ، ئەوێتریان وەکوو شەمامە وایە زۆر تاڵە و گوورژاڵکی پێدەڵێن، بۆ زۆر جوورە نەخۆشیان دەست دەدات بنەکەشی بە ووردکراوی بۆ برین و کرماوی باشە.

**کاڵەکوت:** مێوژێکەبەدەسک و دۆڵ یا بە دەس هاوونگ کوترابێ و کرابێ بەشەربەت.

**کاڵەکی دەنک هەرمێ:** کاڵەکێکە دەنکی وە ئی هەرمێی دەچێ.

**کاڵەکی گوڵپەرچن** (موک.): جوورە کاڵەکێکی زۆر شیرین و دەنک گەورەیە.

**کاڵەمستانە:** کلاوێن، گەمەیەکە.

**کاڵەمستێ:** کاڵەمشتێ، کاڵەمستانە، جوورە یارییەکی منداڵانە، یەکێک چتێکی لە قوڵی مستیدا دەشارێتەوە و هەرکەسێکی بیدۆزێتەوە دەبێتە هی وی.

**کاڵەمشتێ:** کاڵەمستێ.

**کاکڵەمووشان:** جاڵجاڵووکە.

**کاڵەموویین:** کاڵەییێکە هەمووی لەبەنی موو دروستکراوە.

**کاڵەنوێژ** (خۆ.): کاتی بەیانییە، کەنەزوو و نە زۆر درەنگ بێ.

**کاڵەوبوون:** کاڵ بوونەوە، ڕەنگ ڕژییشتن.

**کاڵە و پێتاو:** بەوچتانە دەڵێن. کە لەپێدەکرێن وەکوو پێڵاو و گۆرەوی و بەلەک پێچ و گۆرەوی نەژنۆیان.

.**کاڵەهێش:** زەوییێکە تەواو کێڵرابێ و تۆویشی پێوەرکرابێ، یەکپێشە.

**کاڵ بوون** (زا.): پیربوون.

**کاڵبوون:** بێڕەنگبوون، ڕەنگ کەمکردن. ـــ موە: چوونەوەی ڕەنگ.

**کالسکە:** گالیسکە، عەرەبانەی سواری.

**کاڵک:** نەگەیشتوو، خاو. (کە.) کاڵەک، کاڵ.

**کـاڵک** (بـاک.): کاڵـە، باپـیر. (بـار. کـە.) میوەییێکـە نەگەیشـتبێ، کـەرک، کۆڵـە، تـەعلک، زرک، کـاڵ. (زێ.) سەوەتە، قەرتاڵەی چکۆڵە، چنەرزێ.

**کاڵکەبۆ** (ڕوو.): کاکڵەگوێزی لەسەر ئاوری سووردەکەنەوە و دووایە دەیکوتن و لە نێو چێشتی دەکەن.

**کاکڵەگوێز:** کەمکۆڵ.

**کاڵکەن:** میوەییێکە بـە کاڵی لێ بکرێتـەوە پێش گەییشـتنی. قونێرێکە پێش گەییشتنی دەرگای بکرێتەوە.

**کالکی** (باک.): شیرەگری، مافی میراتگری.

**کالیکە:** چوواردانن لەبنەوە، کە کەوتن دەرنایەنەوە.

**کالۆش** (موک.): چێشتێکە: دژی خەستی کەشکی سوواوەوە بەبرنج و یا ساواری لێدەنێن و ڕۆن و پیوازی بەسـەردادەکەن. پێڵاوێکـە لەسـەر قۆندەرەوپۆتین و ئیتر لەپێ دەکرێ لەکاتی قوڕ و چڵپاوێدا.

**کاڵ و کرچ:** کاڵ، چتی زۆرکاڵ و نەگەییشتوو.

**کاڵ و کۆڵ:** نەگەییشتوو، کاڵ و کوول.

**کالوومە:** شیری ژەنگاوی و کالانشکاوە.

**کاڵومەکاڵ:** کشت و کاڵ، کشتوزار، کێڵراو، نەکێڵراو.

**کـاڵێ:** نێـوی ئافرەتانـە. منداڵـی سـپیکەڵە. کاڵـە. نەگەییشـتوویی، نەگەیوی میوە و نەکوڵاوی گۆشت.

**کاڵێن:** کالان، کێلان.

**کالیار:** ترێزووی هەرە گەورەیە بۆ تۆوی دەهێڵرێتەوە.

**کالیان:** هەڵکاڵان و تووک لە یەکێک کردن، خورین، داخورین.

کۆلیت، کالێتگا: حەشار، حەشارگە، شوورێنێکە لە هەزگ و هـەژاڵ و پووش و گەڵا دروستەکرێ ڕاوچی خۆی تێدا لەحەشاردەبێ بۆ کوژتنی نەچیر.

**کالێتگا:** شوورێنی کۆلیت، کالیت.

**کالیسکە:** پایتوون، فایتوون، گالیسکە، ئارەبانە.

**کالیسکەی سەربەفر:** عەرەبانەی سەربەفر، باخێڵ، تاخووک.

**کالیمسـت:** گەغێکـە لەسـەرخەرمان بـدرێ بـە هـەژار، بـەڵام بـەناوی زەکاتەوە نەبێ.

**کـالین:** کێلاتـن. (بـاک.) بالاندنی بـەرخان. (ڕەوا.) گریان. (ئـەردە.) کێلان.

**کالێنچە** (ئەردە.): جوورە کۆترە کیویلەیێکە.

**کالیۆش:** چێشتێکە لـە کشمیش و گوێـزی کوتـراو و ڕۆن و دۆکەشـک دروستدەکرێ.

**کام** (موک.، بابا.، کە.): بۆ دیاری کردنی چتی پێویست بۆ پرسیارە، کێها، کامە، کامەتا، کێژک، کامیان. نە. نەخۆشییێکی ووڵاخانە: ئەگەر لەنێو چەند ووڵاخێکی جۆ بە هەمووان بدرێ بە یەکێکی نەبێ یا درەنگی بدرێتێ دەڵێن ــ ی کردووە تاکامی نەئاژنن چانابێتەوە و جۆشی پێ ناخورێ واتە تا بەسووژن بن ددان سووژن ئاژن نەکەن و کەمێک خوێنی لێ نەیەت چانابێتەوە. بەخت، ئارەزوو، هات، مەبەست، مـراز. (باک.) جەنجەڕێکە لەداری گێرەی پێدەکەن.

**کاملخ** (باک.): ڕان، سمتی مرۆڤ و گیانداری تر.

**کامار:** کەمە(کەوە) ی بێژنگ و دەفە.

**کام ئاژنین:** بەسووژن بنددانی ووڵاخ و ڕەشەووڵاخ و ئیتر ئاژنینەوە، کە کامیان کردبێ.

**کاماش** (باک.): تووتنی سەبیلە، کەبەسەوزی ووشک کرابێتەوە.

**کاماڤ** (باک.): ئاوی ڕاوەستاو، ئاوێکە، کەلـە جۆگەداما بێتـەوە دووای بڕینی لەسەرچاوە.

**کامە:** کام، کێها، کامیان.

**کامەتا:** کێها، کێهاتا.

**کامەتانێ:** کێها، کامەیان.

**کامەتە:** کێهایە؟

**کامەران:** بەکام و نارەزوورگەییشتوو. ــ ی: بەئامانج و ئاواتگەییشتن.

**کامەکامە** (کە.): چاوبزدان.

**کامباخ** (باک.): کەمباخ، کاوول، وێران. ــ کرن: وێرانکردن.

**کامڕان:** خۆشبەخت، بەختیار، کامڕەوا، بەدڵخوازگەییشتوو. ــ ی: خۆشبەختی. نێوی پیاوانە.

**کامکردن:** هەڵامسـانی مەڵاشووی ووڵاخی یەکسم لـە کاتێکا، کـە ووڵاخیتر لەبەرچاوی وی ئالیک بخوا هی وی لەبیرکرابێ یا هەر نەبێ بیدەنێ و یان درەنگی بدەنێ.

**کامڵ:** چتی پێگەییشتوو و گەییو، تەواو.

**کامن:** کامەیانن، کامەن.

**کامۆخ** (زا.): کەسێکە ترێ بگوشێ.

**کامۆیی** (باد.): کامکردن.

**کامووس:** کابووس، مۆتە، (هەو.) مۆتەکە. ــ ک (کۆ.): مۆتە.

**کامیان:** کێهایان.

**کامێرە** (باد.): کەللەی سەر.

**کان:** کانگە، لاژوارد، ئەردزین، بەجێگایەکی وادەڵێن، کە سروشت لە زێڕ و زێو و بەردی نرخدار کۆی کردۆتەوە کونی دەکەن و دەری دەهێنن. کونێکە، کەدارتاش بە ئەسکەنەلەداری هەڵیدەکەنێ.

**کاناڵ:** دڕناڵ، درگە، کرتاڵ.

**کانانێ** (هەورا.): دوگمە.

**کانە** (باک.): ئەستوور، گڕ، زوور. (فە.) کون، کەوون.

**کانەزبانە:** کانەزووانە، چاڵێکبەدرێژی لەباهۆی پەنجەرەدا هەڵدەکەنرێت بۆ ئەوەی شووشەی تێ بخرێت.

**کانەزووانە:** کانێکە، کەزمانەی داری تێدەخرێت قوولایی جێگای شووشەیە لەپەنجەرەدا.

**کانەشکاف:** کانەشکافە.

**کانەشکافە:** کانێکی درێژکۆڵەیە دارتاش بەچێتێکی تایبەتی هەڵیدەکەنێ لەسەر باری درێژی بۆ تێبردنی شووشە یا تەختە.

**کانەشکاو:** کانەشکاوە.

**کانەنیا** (ئەردە.): ڕوواندن.

**کانبۆرە** (کۆ.): پاڵەوان.

**کانترۆک** (باک.): کانبڕۆک.

**کانج** (هەکا.): بێتۆرە، بێشێواز.

**کاندا** (شەبە.): بۆکووێ، کووێ، کێندەرێ.

**کاندو** (باک.): کۆندۆ (بۆ مانگابەکاردەبرێ).

**کانک** (باک.): قۆچەقانێ.

**کانکەر** (باک.): ددانەکانی بڕۆکی خوارەوە.

**کانکەرک:** ئەوپەڕی بەرزی بڕۆکی خووارەوە، پایانی بەرزی بڕۆک.

**کانگ** (بار.): خاڵخاڵی گەورەگەورە، پنۆک پنۆک.

**کانگا:** کان، لاژوارد. گۆنەر، هارەت. بنەبان، قوولایی، لە ـــ ی دڵەوە: لەقوولایی دڵەوە. هەرەت، کات. بناغەی خانووبەرە و دیواران.

**کانگە:** کانگا.

**کانگێر:** تات، تەختەبەردی ڕەق و پانە.

**کانوون:** دومانگە لە نێوانی تشرینی دووەم و شوباتدا، بەفرەمبار. ـــ ا پێشی: پێش کانوونی یەکەم. بەفرەمبار ۳۱ ڕۆژە. ـــ پاشی سەری ساڵە ۳۰ ڕۆژە.

**کانونی:** باڵندەیێکە ماسی خۆرە وەکوو قەلەراوی وایە، بەلام بۆرە.

**کانێ** (هەو.): کووانێ، (هەو.) کا.

**کانیسە** (ڕەوا.): غیرەت، هەڵگرتن، دەمار. ـــ م هەڵناگرێ: پێم هەڵناگیرێ. ـــ گرتن: هەڵگرتن، ددان بە جەرگی خۆدانان.

**کانی:** هانە، (هەورا.) هانەوچەمە. سەرچاوە، چاوە، چاوگە، (دەر.) گێتی، کانیاو، سەرچاوە، زەوییەکە لەخۆوە ئاوی لێ هەڵدەقوڵێ لەبەهاراندا و یا هەمیشە. (باک.، هەو.) کووا، کووانێ. ـــ چاف: گلێنەی چاو.

**کانیاو:** کانی، چاوگە، چەشمە، ئاوی کانی.

**کانی چاو** (ڕەوا.): قولینچکی چاو بەلای کەپووە، (باد.) کانیکاچاف.

**کانیژۆک:** کانترۆک، گیایەکە بۆ کەچەڵی باشە.

**کانیک** (باک.): قۆچەقانێ.

**کانیکاچاڤ** (باد.): کانی چاو.

**کانیلە:** کانی چکۆڵە.

**کاو:** دەرد، داخ: ـــ ی دڵی خۆی پێ ڕشت. خۆشی، کەییفخۆشی، کەیف، ویست. (فە.) چیا، کێو، گەشتی سەرکاوان: گەڕانی سەرچیا و هەردان. (شار.) کایە، کەرەت (لەگەمەدا). ئەشکەوت یا تیسماڵێکی سەختە لەنێوقەدی چیایاندا، کەوڕگ، مەڕ، عەلی بەردەشانی دەڵێ: ڕاوچی وەرن لەبۆ ڕاوێ، عەلی عاسێ بووە لە کاوێ. (باک.) هەوا، فیز. (هەورا.) بەرقەد، تاقی ناوشاخ.

**کاواتر** (هەورا.): کۆتر. ـــ ی (هەورا.): کۆتر.

**کاوان** (هەورا.): شوێنێکە لەنێو چیایاندا، کەسەخت و تووش بێ، ملە.

**کاوانەوە:** کاوێژکردن. چووزانەوە.

**کاوە** (هەورا.): چیایەکە زۆر بڵند و سەخت بێ و سەریشی بەلایەکیدا کووڕ بووبێتەوە، ئازار و ئێشێکیشە، کە لەئەندامی مەردوم پەیدا دەبێ بەهۆی کارکردنێکی زۆرەوە. داری گەندەڵە.

**کاوەتری** (هەورا.): کۆتر. ـــ کوویی: کۆتری کێوی.

**کاوەخۆ:** هێدی، لەسەرەخۆ، هێواش، ڕزگار زۆر بە ـــ یە: لەسەرەخۆیە. بە ـــ: وە ـــ : بەئەسپایی، دزراوی.

**کاوەکاو:** سۆڵەسۆڵ، قرچەقرچی کاویان.

**کاوەلی:** دەستە سەماکەرێکی گەڕیدە و سووک و بیانین.

**کاوبا** (کە.): وەراوەی پرووپووچ، خەیاڵاتێکە مرۆ لەمزگی خۆیدا دەیانکولێنێ.

**کاووت** (هەورا.): مانگ.

**کاودان:** قاوورمە.

**کاووڕ:** بەرخە، کاڤر، دەکوو، (باک.) کەهیر، بەرخەنێریامێ، کەتەمەنی لەپێنج شەش مانگان تێپەڕیبێ تا دووساڵان.

**کاوڕبەران:** (کە.) بەرخەبەران، کاوڕێکە کاتی تەگەی هاتبێ.

**کاوروبورجی** (هەورا.): بەرخی چەرخ.

**کاووز** (دەر.): پۆلکەگایانەیە.

**کاوول:** خەرابە، کەمباخ، وێران، وێرانە، کاوولگە، تارومار، خاپوور، کەلاوە، پتیوا، فیهوورچۆ، زەبەر. کووپەی گاسنی.

**کاولاش:** کاوول، کەلاوە، لەکەلاوەی ئاشەوە ماوەتەوە.

**کاولان** (بار.): کالانی خەنجەر.

**کاولەخنوو:** خانووی وێران و چۆڵ.

**کاولەکودوو:** کوولەکەی بەتاڵ.

**کاوولبوون:** کەمباخ و وێران بوون، ڕمان، تێکدران.

**کاوولکەردەی** (هەورا.): کاوولکردن، ڕووخاندن.

**کاوولکردن:** کەمباخ و وێرانکردن.

**کاوولگە:** وێرانە، کاول، کەلاوە، (هەکا.) کەمباخ.

**کاوڵی:** بڕوانە: کاوەلی.

**کاوڵێ:** بێژنگ فرۆش، قەرەج.

**کاولی:** وێرانی.

**کاوێ:** قانگ، پووت.

**کاوێژ:** کایین، دەم بەیەکدادان وەکوو جوونی بنیشت و ـــ ی ئاژاڵ و ماڵات، جوونەوەی ئاژاڵ و ماڵات ئەو ئالیکەی، کە خواردوویەتی و لە ناوزگیدایە دەیهێنێتەوە دەرێ بۆ کاوێژ و جوونەوەی.

**کاوێژکەر:** گیاندارێکە کاوێژی بکات.

**کاوێژکردن:** کاوینەوە، کاوانەوە، (باک.) پۆرساندن، مەبەس لەرەشەوولاخ و ئاژاڵ و وشترە بەزۆری بەهاران زۆری دەخۆن و بە شەو یەقی دەکەنەوە دووبارە دەیجوونەوە تابۆیان حەرس بێ.

**کاوێژکردن:** واتەی قۆڕو ناپەسەندکردن، قسەی قۆڕو ناپەسەندکردن.

**کاویان** (ئەردە.): چووزانەوە، کاویانەوە. ـــ ەوە: چووزانەوەی زار لەبەر خواردنی بیباری تیژ.

**کاویە** (کۆ.): نەخۆشییێکی داری ئەستوورە ناوەکەی پووک دەکات و دەکەوێ.

**کاویت** (باک.): قاووت.

**کاویر** (باک.، زا.): میوەییێکە، ووشترخوار.

**کاوین** (ئەردە.): مارەیی ژن.

**کاهوو:** پتر بەسرکەوەدەخورێ، کاهی، گیایەکی گەڵاپانی بەهارییە بەتۆو دەچێنرێت وەکوو کەلەم وایە، بەڵام نابێ بە تۆپ، کەژیشی هەیە بەقەد ناوشاخەوە لە کوێستانانەدا سەوزئەبێ، بەڵام کەمێ ڕەگی تاڵی هەیە، بەکەژییەکەی دەڵێن (هەورا.) پاخڕوانە، لە ئایینی یەزیدییاندا خواردنی دروست نییەگۆیا، چونکوو پیاوێکی ئایینداری تێدا کوژراوە وخوێنی وی پێدارژاوە.

**کاهەرزانی** (هەورا.): هەنجیری ڕەشی زل.

**کاهێل:** سست و تەنبەل. ـــ ی: سستی و تەنبەڵی.

**کاهی** (کە.): جوورە نانێکە بەهەنگووینی و نیشاستە پەروەردەدەکرێ. کاهوو.

**کاهیچی:** کەسێکە کاهی بۆ فرۆشتن دروست بکات.

**کاهین:** ڕاز زان، پۆشەوێژ، پەریدار، نهێنگۆ، نهێنی زان.

**کایە:** نۆرە، نۆبە، نۆرەناو، نۆرەگاکەل. تەتەڵەمیران، گەمە.

**کایەکلێ** (ئەردە.): کایە.

**کایەگا:** جێگای کایە.

**کایەلووش:** خواردەمەنییێکە لە کشمیش و کاکڵەگوێز و ڕۆن دروستدەکرێ.

**کایەڵ:** مەردومی خاو و خلیچک.

**کایەن:** کادان، کادێن.

**کایلۆش** (ئەردە.): دۆشەک، کالیوش.

**کە:** ئەگەر، کەتۆ لێرە نەبای ئەمن نەدەهاتم. بکە، ئیتر، تر، ئیدی، هیکە. کاتێکی، دەمێکی، کەتۆ هاتییە ماڵی ئازادی ئەمن لەوێ بووم. بۆ بەندیواریش بەکاردەبرێ: ئەو نامەیەی، کە بۆمنت نووسی بوو وەڵامم دایەوە. مرازێکە، کە بکەوێتە نێوانی دوو ووتارانەوە ووتاری دووەم تەواودەکات: ئەو کەسە بە پیاو و مەرد دەژمێردرێت، کەیەکڕەنگ بێ.

**کەباب:** کەواو، گۆشتی ئەنجنراو و برژاو و لەشیش دراو.

**کەبابە:** دانەییێکی ڕەشە لە بیبار (ئیسیوەت) زلترە. کەبابەی چینی.

**کەبابەبوون:** مەبەس لە گەورەبوونی جووچکی باڵندەی کەوی و کێوییە، کە لەوانە بێ گۆشتەکەی بخورێ.

**کەبابەی چینی:** چتێکی دەنک ووردی گەرمیانییە وەک کونجی بۆ بەربوونی دەنگ دەخورێ و بۆ ڕەوانی دەدرێ بەمنداڵی ساوا.

**کەبابچی:** کەواوچی، کەباب برژێن، کەبابفرۆش.

**کەبابخانە:** دووکانێکە تەنها کەبابی لێ ببرژێنرێ و بفرۆشرێ.

**کەبابی:** خێڵێکی کوردە دووتیرەیە، ١) زاگا، ٢) شەموولە لەکەنار هەولێرێ دادەنیشن.

**کەبات:** دارێکەبەقەد دارسێوێکی بڵنددەبێ بەرەکەی لە لیمۆ زلترە گڕنی گڕنی درێژووکەیە و دەخورێ لەترشیدا بۆ مرەباش بەکاردەبرێ.

**کەبادە** (ئەردە.): کەوانەییێکی ئاسنینە زنجیرێکی ئەستووری پێوەیە زۆرخانەچی لە کاتی وەرزانەوەدا هەڵیدەسووڕێنێ.

**کەبار** (ڕەوا.): سەڵا، مەلایان شەوی هەینییان لەسەربانی مزگەوتان بەدەنگی بڵند بەزمانی ئارەوی بەخووا و پێغەمبەری هەڵدەڵێن، سەڵای پێدەڵێن.

**کەبانوو:** کەیبانوو.

**کەبانی** (باک.): کابان، (باک.) کەبانوو، کەیبانوو.

**کەبەر:** شەفەلە، گیایەکە لەگەڵ سیری بکوترێ و لەسەر شوێنی باداری داندرێ زۆر بە سوودە. گیایەکی هاوینییە گەڵایەکەی بەکوتراوی بۆ دووپشک و مارپێوەدراوان زۆرباشە بە خوواردن و لەسەربریندانان، گوڵەکەی وەکوو گوڵی گوڵاوییە، بەڵان هی زەرد و سپیش هەیە بە بەرەکەی دەڵێن (شەفەلە) بەقەد سێوێکی دەبێ و دەقەڵشێ و دەبێتە چووارکووز ناوی سوورە و دەنکیشی تێدایە، شەفەلە تەنهابۆ خوواردنێ باشە، گەڵای یا کۆلکەکەی بە ووردی لەگەڵ ئاردی تێکەڵ بکرێت و تادوو کاتژمێران لەسەر جێگای باداری دادەنرێت دەیسووتێنێ لک و گەڵایەکانی وەک تووترک وایە.

**کەبەرەزبرە** (زەن.): بەردەزوور.

**کەبلەمە:** کەپلەمە.

**کەبوورە** (ئەردە.): پشێوی، ئاشێو، ئاشوو، (ئەردە.) خەڵوو.

**کەبیسە:** برێتییە لەساڵی تەواو ئەوساڵەیە، کەمانگی شوبات ٢٩ ڕۆژە بەچووارساڵان جارێکی ساڵی کەبیسەتەواودەبێ ساڵی میلادی (زایین)، کەدابەش بکرێ بەسەر ژمارەی چوواردا کەم و کووڕی نەما و شایانی دابەشکردن بوو ئەو ساڵە ساڵی کەبیسەیە ئەگەر کەم و کووڕی (کسر) ی مایەوە بەوساڵە ناڵێن کەبیسە.

**کەپ:** چەمۆڵە. (سوو.) کەپۆ.

**کەپە:** دەنگی کسێکییە، کەددانی نەمابێ، کەپەکەپ، کەپەی یەک لەدووای یەکتری.

**کەپەبێل:** بێڵی کۆنی دەم شکاو.

**کەپەر** (کە.): پیاوی بێ ددان یا ددانی پێشەوەی نەمابێ. تەنبەڵ، سست، کەودەن.

**کەپەز** (باک.): تەپە، گرد.

**کەپەزە** (کە.): نێسک گران.

**کەپەک**: کێم خیتە، سۆس، (شەبە.، ڕۆژ.) پنس، سۆ، تیکوڵی گەنم وجۆ و دانەوێڵەی هاڕدراوە، کە بە دابێژتن گیرابێ سەرکۆتەڵی ئاردی دابێژراوە.

**کەپەکەپ**: مرۆی بێ ددانە، کەباخووێ، فلتەفلت.

**کەپەلەک** (زا.): کرمی مافەتە.

**کەپەلەکی** (زا.): مەڕێکە، کەمافەتە لێیدابێ.

**کەپەنە** (باک.): کەپەنەک.

**کەپەنەک**: کەپەنە، فەرەجی، قاپووت، فەرەنجی، فەرەجی لەگەڵ قاپووت جیاوازییان ئەوەیە قۆڵی نییە، بەڵام دوو گوێچکەی هەیە، کۆچەرو شوان و گاوان و جووتیاران لەبەری دەکەن لەبەرباران و بەفرو سەرما.

**کەپەنەکداڵ** (کە.، ڕۆژ.): لاشەخۆرە، کەرگەز، داڵاش.

**کەپەنەک**: بڕوانە: کەپەنەک.

**کەپەنکە** (موک.): بەگوڵی دەغڵی دەڵێن، کەخۆی گرتبێ و لەنێوکیفیدابێ.

**کەپچاندن** (باک.): دوواندن.

**کەپچین** (باک.): دووان.

**کەپر**: سێبەرێکە بریتییە لەچووار کۆڵەکە، کەسەریان بەدارو هەلاش گیرابێ لە هاویناندا لەنێو باخچە و باخ و شووێنانی تردا، سابات، سقدە، زنج، قۆختە، (دەر.) قووخ، (هەورا.) هەرزەڵە، (شکا.) حۆلک. ــ بۆسێبەرە، سەیوان.

**کەپرەسەوزە**: کەپرەشینە.

**کەپرەشینە**: جێژنەیێکی تایبەتی جوولەکانە لە پاییزاندا کەپرێکی بەمیوە و پەلکی داران دەرازێننەوە لەهەموو ماڵێکیدا دووای جەژنەکەیان میوەکەی دەخۆن.

**کەپرۆکە**: کەپری چکۆڵە. چڵەگیایەکە کەبستێک بڵند دەبێ و بێ گەڵایە سەری کارتەکانی گوڵی بەقەد زەنگیانەی دەردەکات خڕ و سوور و زەردی تێکەڵاوە، بەخوێوە یابەماستەوە دەخورێ.

**کەپرۆکەبەستن**: کۆبوونەوەی کەف و خڵتەیە لەسەر چتی شل: پرگی ترشیاتەکە کەپرۆکەی بەستووە.

**کەپسوول**: ئەزبە.

**کەپک** (یەز.): کەپۆ، لووت. قیتکایی سەرشاخان، لووتکەی سەر چیایان، کڵاوە، قوتکە، کڵۆپینک. سێبەری شاخ و ماهـ وکەژ وکێوانە.

**کەپکەبەفر**: ڕنووەبەفر.

**کەپلە** (کە.): ئەسپێی مریشکانە.

**کەپلەمە**: دەرمانێکی هاڕدراو و یاچتی وورده، کەبکرێتە سەرلەپی دەست و بخورێ. ــ کردن: خواردنی کەپلەمە.

**کەپ لێگرتن**: چەمۆڵە لەچتێک یا کەسێک نان.

**کەپن**: کەسێکە لەقسە و ئاخۆتندا کەپەی لێوەبێ.

**کەپۆ**: (فە.) لووت، (شکا.) پووز، پۆز. دفن، دم، (هەورا.) کەپ، (شکا.، نەهـ.) بێقل، بێهقل. لووت، (یەز.) کەپک، (زرا.، ڕۆژ.) پت، (هەورا.) لیت، پێچووان، کەپوو، (باک.) کەپی، قەپۆز، کەپووڵ.

**کەپۆبەراز**: دفن بەراز، کەپۆزل، کەپۆبەران.

**کەپۆڕاسان**: پژان، داڕسان، خووێن بەربوونی کەپۆ.

**کەپۆزل**: لووتزل.

**کەپۆڵ** (ئەردە.): کاپۆڵ.

**کەپۆڵک** (ئەردە.): کاپۆڵک.

**کەپوو** (ئەردە.): شەویلکە. بێددان. کوند، کوندەبەبوو. کەپۆ، لووت. (فە.) جوورە پەپوولەیێکە لەناو باخ و باخچە و کشت و کاڵاندا لەش گچکە و باڵ گەورە و ڕەنگ بۆرە.

**کەپوورە** (ئەردە.): هەراهەرا، قوولەقوول، هەنگامە.

**کەپووکەرە**: باڵندەیێکە لە کاتی خووێندنیدا دەڵێ کەپوو.

**کەپوول**: کاسەی سەر، کەللەی سەر.

**کەپووڵ**: کەپۆ، لووت.

**کەپوولە** (ڕەوا.): جوورە ئەیارێکە مەزەی ناشی پێدەگیرێ. کۆتکی دارینە لەناشیدا، کە گەنم ٦مست کەمتر بێ.

**کەپی** (باک.): کەپۆ.

**کەپییان** (باد.): ناوە بۆجوورەهەنارێک.

**کەپیلە** (باد.، کە.): کەپوولە.

**کەپی لەڤ** (باک.): لمبۆز، لمووزی وولاخان.

**کەت** (موک.): قەتێ (باڵندەیێکە)، کورکورە. چووارپا، چارپایە، تەختی نووستنێ. (زا.) وێنجە. (خۆ.) تاق، تاک. کەرت، لەت، کوت، پارچە. (هەورا.) کەدی دارانە بەگەڵاوە. (باک.) جوورە پاقلە و جوورەگیایەکە. شان، پترلەگەڵ ووتەی گۆڵدا بەکاردەبرێ: ــ وکۆڵ: واتەشان و کۆڵ. لادانێکە لە نانەواخانەدا ئاردی تێدەکرێ. (باد.) یەک.

**کەتان**: کرێکی تەنکە لە دەزوو دەچێنرێت و سپییە و ناسک و بەنرخە ئافرەتان دەیکەنەکراس و سەرپۆش، بۆمەندیلیش بەکاردەبرێت. گیایەکە گوڵدارە وەکوو هەرزنییە گوڵەکەی مانگەشەوی چاردە لێیدا هەڵدەوەرێ تۆوەکەی بەکوتراوی و کوڵاوی لەهەر جێگایەکی ئاوساوی لەشی دابنێن دەی نیشێنێتەوە لە لاسکەکەی وەکوو گوش هێندێ چتی تەنراوی لێدروستدەکەن، بەگیایەکەش هەر دەڵێن کەتان ڕۆنی دەگیرێ بۆ خواردن و سابوون و زۆر چتیتر. ڕووپۆش.

**کەتان و کەوان** (ئەردە.): پەردە و کوللە.

**کەتانی**: جوورە بادامێکی تێکوڵ تەنکە.

**کەتە** (موک.): جوورە قووبوولێکە، ووشکەپلاو. کەتی نانەواخانە، جێگای ئاردی نانەوایان. (کە.) زەلام، زەبەلاح، لەندەهۆر.

**کەتەپلاو**: ووشکەپلاو.

**کەتەچلاو**: کەتە، ووشکەپلاو.

**کەتەن** (ئەردە.): کەلەپچە.

کەتەن

**کەتەو** (باک.): نەخۆشییێکی ووڵاخانە دەیکۆخێنێ.

**کەتەوقوپوولی** (موک.): هەردووک هەر پلاوی قوبولین.

**کەتر** (موک.): بەهاریەندی پێش پەنجەرانە.

**کەترە**: بەرچەند ئاژاڵانە دەڵێن، کەوەدووای مێگەل دەکەون، ئاژاڵ و ڕەشە وولاخی لاواز و لەر. (ئەردە.) خەوشدار، دەغەڵ، ڕەخنە، ئاهۆ، نەنگ، بەدی، چەپەڵی، خراو، گەند، نەخۆش، لەرولاواز بۆ ماڵات و ئاژاڵان بەکاردەبرێ. ـــ ی: نەخۆشی، لەری، دەغەڵی، چەپەڵی، خراوی، هاکۆ، ئاخۆتنی بەبێ مەبەس.

**کەتری**: کتری، کەتلی، چادانی چینکۆ.

**کەتک** (باد.): هەنجیری ووشکی ناومەشکاڵە.

**کەتکەتە** (باد.): یەکەیەکە، تاکتاکە، تاقتاقە.

**کەتەکەت**: سووکەسووک، خۆپێوەنان.

**کەتن**: تاوان، پەند، پیسی، هەتک، ئەتک. تەرن. کەوتن، کەفتن. نیشەڤ گوور کەت ناڤ پەزێ مە: ئەمشەو گورگ کەوتە ناومەڕی مە. ئەڤ نیش کەتیە دەستێ وی: ئەو کارە کەوتۆتە دەستی وی. ـــ جە: بەجێ. ـــ پێش: وەپێشکەوتن. ـــ سەر: کەوتنەسەر، خۆناوێژتنەسەر. ئاگربێژنگا کەت: دارەکە ئاوری گرت. شەڤ کەت سەرمە: شەومان بەسەرداهات. ـــ سەرهەوا: تۆگری یەکتری بوون. گۆتنا تەکەت سەرێ من، ئەوەی پێت کوتم تێی گەییشتم. کەتییەگوهێ من: بیستوومە. بدەرکەتن: چوونەدەر. بەهەڤکەتن: ڕێک کەوتن، برێ ـــ: وەرێ کەوتن. برەش ـــ: بەرەشداکەوتن، تووشی ئەبوونی و ڕۆژی ڕەشبوون. ئەم برێیا بیدلیسێ کەتن: ئێمە ڕێگای بتلیسێمان گرت. ژێکەتن: لێکەوتن، لێفرێدران، پەرین. ژهەڤدەکەتن: خەمخواردن، بەپەرۆشبوون. ژسەردەکەتن: وازلەخوو و ڕەفتارهێنان. لێکەتن: کەوتنەسەر، گەییشتن، لێپەیدابوون. چرانینە، کوهەتا سبەهێ پێبکەتنێ: چرانییە، کەتاسبەینێ بسووتێ. بەرکاتفەنگێ لمنکەت: گوللەی تفەنگێم وێکەوت. بەهەوا ـــ: بڵندبوون. چاولێ ـــ: دیتن. لبەرکەتن. بەش: تشتێکو لمن بکەڤە ئەزێ بدەم: ئەوەی لەمن بکەوێ من بەشی خۆم دەدەم. لبەر ـــ: وەبەرکەوتن. لهەڤکەتن: شەڕکردن. لپەی کەتن: وەدوواکەوتن. ناڤهەڤکەتن: کەوتنە ناویەکتری. ـــ پێکردن: تەرن پێکردن.

**کەت و پیت** (هەورا.): تاق و لۆق، تاقتاق، کەتکەت.

**کەت و کڵفت**: گیانداری زل و لەندەهۆر و تێکسرماو.

**کەتوو**: ئاسنێکی دەمپانی چووارسووچی درێژکۆلەیە کلکێکی دارینی هەیە دێراوی پێ هەڵدەدرێتەوە. ئاوی کێوێکییە لە شارباژێر بەردی بەرداشی زۆرە.

**کەتوومەت**: کوتوومت، دەق وەک وی.

**کەتوون** (ئەردە.): کەمەند.

**کەتی** (باک.، باد.): کەوتوو، بێچارە. (باک.، باد.) وێنجەکێویلە.

**کەتیبە**: گوریسوانەی خشتی سوورە.

**کەتیر** (ئەردە.): شەخرە، شەخرەکێش.

**کەتیرە**: جیوەی گووینی و داروددرەختانە، کەمزۆر جووری هەیە، جەوی. ـــ ی جەباری: جیوەی تەپڵەگوویینییە. ـــ ی سپی.

**کەجان**: کەچۆ.

**کەجی** (زا.): کشتەکی بادراوی لووسکراوە.

**کەچ** (باک.): کچ. شەفتوور، کل. خووار، گێر، لار، کەل، ناڕاست، چەفت، نیل. خوویل. خوویل: ملێت خۆ خووێلکرن: ملی خۆخووارکردن، لارێ، کەچرۆ.

**کەچانی** (باک.): کچێنی، تەمەنی کچی جحێڵ.

**کەچایی**: ئاستی خووارایی و کەچی چتی.

**کەچە**: ئاژاڵی شاخ خووار. (شەم.) لباد. فەرەجی بێ قۆڵی ئاودامان.

**کەچەترێن**: توورە. ـــ کردن: توورەکردن.

**کەچەرە** (کە.): بالقۆزە.

**کەچرۆیین**: خووار ڕۆیین.

**کەچەشاخ**: بزنێکە شاخێکی شکابێ.

**کەچەک** (فە.): پێچ، مەندیل.

**کەچەڵ**: (باک.) سەرداقناو، بێمو. سەربرینداری بێتووک، سەرگەنیک.

**کەچەڵە**: جووچکێکە نەختێ گەورەبووبێ و تووکی پێشووی وەری بێ و هێشتا پەڕی تازەی بەتەواوی نەهێنابێتەوە.

**کەچەڵبوون**: گەورەبوونی جووجیلەیە بە جۆرێک، کە تووکە زۆرەکەی وەری بێ.

**کەچەلباد**: پارچە لبادێکی کۆنە.

**کەچەلۆک** (باک.): چێشتێکە.

**کەچەڵی**: سەرداقناوی، بێتووکی.

**کەچەوبەچە** (ئەردە.): منداڵ، زاوزۆ.

**کەچبانوو**: خاتوون.

**کەچخووال** (باک.): کچی خاڵ.

**کەچرۆ**: چەفترۆ.

**کەچرۆیین**: چەفترۆیین.

**کەچک** (باد.): کەوچک، (باک.) بەبەڵ. ـــ ا چاڤ: بیبیلەی چاو.

**کەچکاچاڤ** (باک.): بەبەڵە، بیبیلەی چاو.

**کەچکان** (باک.): لاقدرێژ، لۆقدرێژ.

**کەچکانی** (باک.): لاتەنیشت. ـــ کەتن: لەسەرلاتەنیشتی نوستن.

**کەچلۆک** (باک.): کچی پازدەساڵانە.

**کەچمام** (باک.): کچی مام.

**کەچمیر** (باک.): کچی شای.

**کەچۆ** (باد.): کچێ (بۆ ئافرەت بەکاردەبرێ).

**کەچێ** (هەورا.): چینی کرێژی سەری منداڵی ساوا و ئاژاڵانە، تۆشکەی سەر.

**کەچی**: لەگەڵ ئەوەش، ووشەیێکە ئەنجام دەداتە دەست وەکوو: چوومە ماڵی دارا کەچی لە ماڵ نەبوو. کەم و کووڕی و خوواری، چەفتی.

**کەچیچ** (زا.): جێگای چینەی پەرەوورانە لە سەرانگوویلکێ.

**کەچین**: کچی بندار.

**کەچینی**: کچێنی، بن.

**کەحلان**: ئەسپی ڕەسەن.

**کەخس:** پیوازی قیسکە.

**کەخسە** (باک.): (باک.) کەخسک، قیسکەپیواز.

**کەخسک** (باک.): قیسقەپیواز.

**کەد:** لک، شفتالیم، کەت، شەغەڵ، لخ، شقک، کارتە، کـەدە. (خۆ.) چووزەڵەی داروگیا، لاخ. (باد.) کار، ئیش. (باک.) میوەی کاروکردار، بەری کار.

**کەدە** (خۆ.): کەد. (باک.) کوڕی نۆکەر، منداڵی نێرینە.

**کەدخووا:** کەیخودا، لەتووژماڵ گچکەترە. ـــ یی: کەیخودایی، کوێخایی.

**کەدخووا** (لو.، فە.، لەک.): کوێخا (لەتووژماڵ گچکەترە)، سەرۆکی چەندکوێخایەکییە. ـــ یی: کوێخایی.

**کەدکار** (باد.): کارکەر.

**کەدکەر** (باک.): کارکەر. ـــ ی: کارکەری.

**کەدوو** (کە.): کولەکە.

**کەدووم** (باک.): کەدینە.

**کەدوون** (زا.): جەرڕەی گچکە.

**کەدی** (باک.، باد.): کەوی، ڕام. ـــ بوون. ـــ کردن.

**کەدینە:** کوپەی چکۆڵە، کەدوو، گڵێنە.

**کەدینک:** جەرە، کووپەڵە.

**کەر:** گوێدرێژ، (فە.) خەر، (زا.) کـەهر، (هەورا.) هەر. (فە.) کاریلە. مرازێکە بکەوێتە دووای هەر وشەیێکی دەیکاتە بکەر: کارەکەر، چێشتکەر. مێگەلی ئاژاڵان. (گەر.، ڕەوا.) کـەرد، کـەری پەزان، کەرێ بزنا. (باک.) پارچە، لەت. بکەرکرن: پارچەپارچەکردن. قەرز، کەرد، لەت. ـــ دان: قەرزدانەوە. ـــ کرن: قەرزکردن. لەسەرەخۆ، هێدی، کەمکەمە. ـــ لێ کردن، لە سەرەخۆ کار لێکردن. ـــ اتی: کەرایەتی.

**کەڕ:** گوێ گران، گوێ تەپ، کەهیر، بێ گووێ، نەژنەوا، کـەڕێل. ڕاوەستاو، پەنگ خواردوو. ئاڤا ـــ: ئاوی ڕاوەستاو. مەڕی ـــ: مەڕی بێ گووێ، گووێ بڕاو.

**کەراخ** (باک.): بەشێکە لەچەندبەشان، دەوڵەمەندێک کارێکی خۆی دەدابەیەکێکی لەچەندبەشان بەشێکی دەداتێ. برنج چنین.

**کەرادە** (باک.): پیرێژن.

**کەرازۆ** (باک.): کەردار. ـــ یی: کەرداری.

**کەراسمار** (هەورا.): کراسمارانە، تووێژی ماری.

**کەراسیسە** (ڕەوا.): کەرمسیسە.

**کەرافی** (باک.): شووم، بەدفەڕ.

**کەراکە** (باک.): باڵندەیێکە.

**کەران** (زا.): چەکوچی گەورە.

**کەرانە:** باجی کەران و باریان.

**کەرانە** (زا.): مەردومی دەوڵەمەندی ماڵدار. کاری کەرایەتی، وەکوو کەرێ.

**کەرانباگاو:** کەرانباوگاو، بۆجنێو بەکاردەبرێ.

**کەرابوکۆشا:** تێکۆشین، کروکاش، کروکاشکەر.

**کەراهی** (باک.): کەرێتی، کەرایی. (باک.) کەڕی، بێ گووێیی.

**کەراوی** (ئەردە.): خۆشاردنەوە.

**کەراهیا:** کرێی کاڵەدرانە، پالادرانە.

**کەراهەدەن:** کرێ دان.

**کەرایەتی:** کەرێتی، کەراتی، کەرانە، کەراهی.

**کەرە:** نووێشک، نقشک، بەرەمەشکە، وێژە، چەورییەکە بـەژەندن لەماست پەیدادەبێ، ئەویش تا نەتووێتەوە دۆک و خڵتەی لێ نەگیرێ پێی ناڵێن ڕۆن. بەردەلان. (هەو.، خۆ.) مەڕی بێ گووێ یا گووێ کورت، کەڕێ، کۆڕی. (هەو.، خۆ.) بەرێکە لە پێش گەییشتنیدا بوەرێ. (دەر.، خۆ.) دارێکی سەوزی سەروپۆپ هەڵپەرداوتراوە. قەلەفر. بێ گووێ، گووێ گران. وێژە. ـــ فرۆ: فرۆیەکە لە ژەکی و شیر کرابێتە فرۆ لەسەر ئاوری.

**کەرڕە:** کەرەفرۆ، شیروژەکی لەسەرئاوری دادەنێن وەکوو پەنیری دەمەیێ.

**کەرەپوو** (خۆ.): تووێکی کاڵ و کرچەوەری بێ، کەرەتوو. (خۆ.) هیچ و پووچ، هیچ. داری زۆر ووشکی گەندەڵە. تووێکیشە هێشتا نەگەییشتبێ. داری زۆر ووشکی گەندەڵ. بەری گیای لەبان، کەوەک وورده لۆکە وایە.

**کەرەپووە:** کەرەپوو.

**کەرەپووسەر:** مەردومی پیری گێژ و وێژی ساویلکە.

**کەرەپوول** (زا.): داگیرکردنی ماڵ و سامانی یەکێکییە، کە لەلایەن یەکێکییەوە زەوتکرابێ.

**کەرەپیف:** گوڵی پیکە و زەل و قامیش.

**کەرەت:** چین، جار، حەل، هەل، دەو، نۆبە، کایە، را، گل، کاو، گەڕ.

**کەرەتاڵەبۆر:** مەڕێکی بێ گووێیە سەروملی دیغ دیغ و لەش بۆربێ.

**کەرەتاڵەڕەش** (هەر.): مەڕێکی بێ گووێیە سەر و ملی دێغ دێغ بێ و لەشی ڕەشبێ.

**کەرەتاڵەسپی** (هەر.): مەڕێکی بێ گووێیە و ملی دێغ دێغ و لەشی سپییە.

**کەرەتاڵەسۆر** (هەر.): مەڕێکی بێ گووێیە و سەروملی دێغ دێغ و لەشی سوورە.

**کەرەتاڵەشین** (هەر.): مەڕێکی بێ گووێ و سەروملی دێغ دێغ بێ و لەشی شین بێ.

**کەرەتە** (هەو.): پانیەکێش، پاژنەکێش.

**کەرەتەبەش:** مەڕێکی بێ گووێیە نوختەنوختەی سوور یا ڕەشی لەملیدا بێ و لەشی سپی بێ.

**کەرەتەی** (هەو.): مەڕێکی بێ گووێیە هەموو لەش و سەری سپی بێ.

**کەرەجنە:** چنگنە، شێرپەنجە، نێرەی جاڵجاڵۆکەیە.

**کەرەجی** (ئەردە.): کەشتی چکۆڵە، دەستەکەشتی.

**کەرەدان:** ئامانێکە ڕۆنی کەرەی تێدا کۆبکرێتەوە.

**کەرەزەڕی:** زۆرەکی.

**کەرەڕەش:** مەڕێکی بێ گوێیە و سەر و هەموولەشی ڕەشە.

**کەرەڕسەر** (هەر.): مەڕێکی بێ گوێیە ڕووی ڕەش و ملی بۆرەو لەشی سپییە.

**کەرەز:** گیایەکی کوێستانییە و بەهارییە گەڵای لە کەرەووز زۆرترە لە ترشیاتی دەکرێت.

**کەرەزیلە** (شن.): گلێرەی پێش بەفرییە، (هەورا.) تەرزەڵووکە.

**کەرەس** (هەورا.): گیایەکە وەکوو بیزا وایە ساقەتی سوورە زۆر بۆنی خۆشە بۆ ترشیات دەبێ و کوێستانییە.

**کەرەسەرشین** (هەر.): مەڕێکی بێ گوێیە ملی مەیلەو شینە و سەری ڕەش و لەشی سپییە.

**کەرەسە:** کەرستە.

**کەرەسەرڕەش** (هەر.): مەڕێکی بێ گوێیە سەری ڕەش و لەشی سپییە.

**کەرەسپی** (هەر.): مەڕێکی بێ گوێیە و سەری و هەموولەشی سپییە.

**کەرەستە:** ترتفاق، سفن، مراز، مرازی پیشەگەران، شرەوپرە، کەل و پەل.

**کەرەسۆر** (هەر.): مەڕێکی بێ گوێیە سەروهەموولەشی سوورە.

**کەرەسیسە:** بەفرێکی ووردی ناوداره بە جلکانەوە دەنووسێ، کەلەرۆژی زۆرساردو تووشدا دەنک دەنک لەهەوای بێ هەوردابێ، بەفرێکی ووردیشە لەپێش بەفری دەبارێ، (جا.، هەورا.) بەفرەپوولکە. (هەر.) جەنجاڵ، کەڵەکە. ـــ لەسەرکردن: کەڵەکە لەسەرکردن، جەنجاڵکردن.

**کەرەشێل** (ئەردە.): کەڵەباب.

**کەرەشین** (خۆ.): کەرووی نان و چێشتییە، کەرەکیفە.

**کەرەشین بۆرە** (هەر.): مەڕێکی بێ گوێیە سەروگوێی شین و لەشی بۆرە.

**کەرەشین سپی** (هەر.): مەڕێکی بێ گوێیە سەروگوێی شین و لەشی سپییە.

کەرمشێل

**کەرەشین سۆر** (هەر.): مەڕێکی بێ گوێیە سەروگوێی شین و لەشی سوورە.

**کەرەفس** (باد.): کەرەووز.

**کەرەفرۆ:** بڕوانە: کەڕڕە.

**کەرەک:** کۆمەڵ، کەڵەکە، زۆری گیان لەبەران.

**کەرەک:** جوورە فەرەجییەکی ئاودامانی بێ قۆڵ و کونە، کەپەنەک، فەرەجی. (فە.) کەرە هەنجیر.

**گەرەک** (هەورا.): (هەو.، کە.) کەرک.

**کەرەکەر:** چتێکە دیوانی نەبێ.

**کەرەکردن** (هەو.): مێوپڕین.

**کەرەکۆر** (باک.): مشکی کوێر.

**کەرەکونتێ:** مرۆڤی زۆرکەر.

**کەرەکێڤی:** کەرەکێوی، گۆر.

**کەرەکێوی:** کەرە کێڤی.

**کەرەکی:** چتێکە تەنها بۆ کەر دەستبدات، ئەم کورتانە ـــ یە.

کەرەکێوی

**کەرەکی دابڕی** (هەو.): گەمەیەکە بۆ فریودانی بێهۆش و گێلان بەکاردەبرێ.

**کەرەکیفە:** کەڕوو، کەرەووڵ، پەژمینە.

**کەرەکێفی** (ئەردە.): کەرەکێوی.

**کەرەکێوی:** کەرەکێفی، فیلەگێژە. کەرکوولان، داعبایەکی کێوییە لەکەری ماڵی دەچێ.

**کەرەکیفە:** کەڕوو، بەڵغێکی سەوزرەنگە لەسەرنانی و چتی غناک دەنیشێ. کەڕوویێکە لەسەر ڕووی بادام هەڵدەنیشێ و تاڵیان دەکات.

**کەرەگەل:** (هەورا.) هەرەگەلە.

**کەرەگۆشە:** کولی.

**کەرەلیاس** (ئەردە.): جارکێش، جارچی، هەڵاڵەچی.

**کەرەم:** کەڵک، بە ـــ نایە: بەکەڵک نایەت.

**کەرەمار:** جوورە مارێکی کەڕی کوژندەیە.

**کەرەمێو:** کەر، داڵەلووک، چۆمیلکە، جوورە مێوێکی کێوییە لەکەنار ئاوان، ترێی زەرد و ووردە.

**کەرەنا:** بۆری، شێپوور. کەڕڕەنا، شێپووری گەورەیە، دووکەڵکێشی سەماوەرێ.

**کەرەنتوو:** داسێکی کلکدارینی درێژی دەم پانە بە پێوەگیوی پێ دەدروونەوە، (موک.) مەڵغان.

**کەرەنسۆ:** بێ گووێ، کەسێکە بەقستی خۆی کەڕولاڵ و گووێ گرانکات، کەسێکە گووێ ڕایەڵ نەبێ.

**کەرەنگ:** جوورە مێشێکی گەورەیە لە هەنگ پەیدادەبێ و هەنگووینی نییە. (زاخ.) کەنگر.

**کەرەنگر:** چڕوچاڵ و گەڵاوەرینی پاییزییە، کە زۆر دەکەوێتە سەر یەکتری و لەسەرزەوییدا دەرزێ.

**کەرەواڵە** (هەو.، موک.): هەوێرکە، بەستەزمان، هەژار، ساویلکە. هەوێردە، باڵندەییێکی گچکە و بۆروکەرە تا نزیکی نەبیەوە نافڕێ، ڕەنگی بۆرو بێ کلکی جووانە لە سووێسکە بچووکترە، کە دەفڕێ دەنگی باڵی زۆر دێ، کورکور، قەتێ، تر، وەژە.

**کەرەوان:** باڵندەییێکە، کەرەوانکە، کەرەواڵە. کەرلەوەڕێن.

**کەرەوانکە:** کەرەوان.

**کەرەوەس:** کەرەووز.

**کەرەوور**(باک.): هەور.

**کەرەووز:** (هەورا.) کەرەووس.

**کەرەووس** (هەورا.): کەرەووز.

**کەرەووڵ** (ئەردە.): کەڕوو، کەرەکیفە.

**کەرەهەنجیر:** هەنجیرێکە بەسەوزی هەڵوەریبێ.

**کەرەهوو** (زا.): بای بەتەووژمە لەهاویناندا.

**کەرب** (باد.): توورەیی، ڕق، قین. ـــ قەبوون: توورە و توند و تیژ. بکەرب: بەسام.

**کەربانن** (باک.): هاندان. بکەرپینە: هاندە.

**کەربەش:** کەڵبەش، گیایەکە. ـــ ە: سپینک.

**کەربۆزک** (باک.): گیایەکە.

**کەربین** (باک.): هاندان.

**کەرپووچ**: خشتی سوورەوەکراوەوە.

**کەرپووچک**: گیایەکە گەزێک بڵنددەبێ و گەڵای وەهی دارەبی دەچێ، بەڵاّن درووی ووردی زۆر پێوەیە سەری هەرکە دەرچوو چەند گوڵی زەرد دەردەکات وەکوو گوڵی گونسەی دەچێ، دووای وەرینی قاپیلکی دەنکی سپی سێ سووی تێدایە منداڵ دەیخۆن.

**کەرپوون**: گووێ گران بوون. زۆرساردبوونی ئاو بەبەفر یاسەهۆڵ، بەفراوەکە کەرپووە.

**کەرپی** (باد.): توورەیی.

**کەرپین**: توورەبوون، رقهەستان.

**کەرپەسە**: گیانداریکە وەکوو مارمێلکە وایە هەمیشە روو لە خۆرەدەکات، کەرپەسە، (ئەردە.) رۆژگارپەرست، رۆجیارپەرست.

**کەرپەسە**: بروانە: کەرپەسە.

**کەرت**: کارت، لەت، کوت، کەرک، پارچە، کەر، کووز (بۆخەیار و ترێزوو)، قاش (بۆ شووتی و کاڵەک). ـــ بوون: لەتبوون. ـــ کردن: لەتکردن. (باک.) گیایەکە.

**کەرتاندن**: کرتاندن.

**کەرت**: باوەڕ، بڵندایی نێوانی دووباخچانە، کورد.

**کەرتە**: پارچەیێکە لە ئاژاڵ.

**کەرتەر** (ئەردە.): کەکرە.

**کەرتەشی**: گیایەکی درواوییە، دەڵێن لە هاوینێدا گوڵێکی خڕی بە تۆپ و درواوی دێنێ لاسکی درێژە و تۆپێکی خڕی گەردی درکاوی بەسەر لاسکەکەوەیە دەڵێن لە هاوینێدا رۆنی لە نێو کونی بنێن ناتووێتەوە، درکەکەرانە، شەکەرۆکە، شەکرۆکە، تۆوی کەنگری، جیوەیەکی هەیە پێی دەڵێن (شەکرۆکە) سپی و کەمێ شیرینچکە بۆ زۆر جوورە دەرمانان بەکاردەبرێ.

**کەرتەک** (زا.): چتی زۆر.

**کەرتەڵە** (هەورا.): قەرتاڵە، سەوەتەیەکی گچکەیە لە شووڵ دروستدەکرێ.

**کەرتەلەر**: وولاّخی بەرزەی لاواز.

**کەرتبوون**: لەتبوون.

**کەرتر**: مەبەس لە مەردومی نەزان دووێ، قسەرەق.

**کەرترێنە** (ئەردە.): دووایین دەست لەیاری گۆرەوێنێدا.

**کەرتک** (باک.): کارتک. گیایەکە. پارچە، کوت، لەت، کەر، کەرت.

**کەرتکەرت**: پارچەپارچەی مێگەل، برەبرە.

**کەرتکردن**: لەتکردن.

**کەرتۆپە**: کرتۆپە، پەتاتە.

**کەرتوو**: کەردوو، ئەو مرازەیە، کەبەدووکەسان دیراوی پێهەڵدەدەنەوە.

**کەرت و پەرت** (باک.): شرەوبرە، سیپاڵ.

**کەرتێنە** (ئەردە): کاکڵەمووشان، تەونی جاڵجاڵۆکە.

**کەرجەرمگ**: کەری سپی، بەنەری، بنەری.

**کەرچلاندن** (باک.): تێکەڵکردن.

**کەرچلین** (باک.): تێکەڵبوون.

**کەرخ**: نووساو، دەنگی ـــ: دەنگی نووساو. بێکەڵک، لەکارکەوتوو. بەڵغ، گۆزەو کووپەکە ـــ بوون: واتە بەڵغیان گرتووە و ئاوی ساردناکەن. (کە.، کۆ.، رەوا.) راست، سنوور، شووێن، قولاّغ. کلا، لە ـــ باری پێشوو، نەمان.گول. تیغی، تیغی ـــ: تیغێکە هێندە کول بووبێ، کەبەهەسانی تیژنەبێتەوە، بۆ مقەستیش بەکاردەبرێ.

**کەرخان** (کە.): خانی کەران، کاروانسەرا.

**کەرخاندن** (باک.): خراو و گەندکردن، تێکدان.

**کەرخاو** (خۆ.): بۆ، گۆل، دەراو، دیراو.

**کەرخەنۆک** (باک.): گیایەکە، کەرخنکێنە.

**کەرخەنێک** (باک.): کەرخنکێنە(گیایەکە).

**کەرخبوون**: خراپ و گەندبوون، گنخان. دەنگنووسان.

**کەرخنکێنە**: گیایەکە بەقەد گەغی بڵنددەبێ دەنکەکانیشی وەهی جۆی دەچێ، بەڵاّن قەڵجغەکانی لە ئیی گەنم و جۆی باریکترە، کەرخەنێک، (باک.) کەرخەنۆک، گیازاخە، سیازاخە، پووشەسوورە، جۆداس.

**کەرخین** (زا.): لەبەرچاوکەوتنی خواردەمەنیەک لەبەر زۆرخواردنی.

**کەرد** (ئەردە.): ئالاّنە، باخچە، سنووری باخ و باخچانە.

**کەردا**: کەرت، پارچە. مێگەل.

**کەردار**: کەرازۆ. کەسێکە کەری هەبێ و بەکرێ کاری پێبکات. (باک.) قەرزدار.

**کەرداری**: ئاژۆتنی کەر، کاروانچێتی، بەکرێ کاربەکەرکردن. (باک.) قەرزداری.

**کەردەنەی** (هەورا.): لەبەرکردن.

**کەردەی** (هەورا.): کردن.

**کەردەیرە** (هەورا.): تێکردن.

**کەردر**: گیایەکە وەک قامیشی گوڵێک دەردەکات دەنکەکانی دەکرێ بەنان، کەردرە، گاڵ، هەرزن، دێمیلە. ـــ ە: تاڵەدێمیلە، کەردر، گیایەکە قووتێکی لێپەیدادەبێ وەکوو هەرزنی وایە دەکرێتەنان.

**کەردوو**: کارتوو، کەرتوو. ئەو مرازەیە، کەبەدووکەسان دیراوی پێ هەڵدەدەنەوە. ئەوجۆگەیەیە، کەلە نێو زەوی کێڵراودا بەکەردوو لێدەدرێ، دیراو. (خۆ.) بڵندایی دیراوە، (کۆ.) بارست. کەردووکێش، کەرەک.

**کەردووکێش** (ئەردە.): ئاسنێکی دەم پانە و کلک درێژە بە دووکەسان دیراوی پێهەڵدەدرێتەوە. کەسێکە بتوانێ کەردوو بەکاربێنێ.

**کەرسلخ** (باک.): سەکۆیەکە لەخیزی رێک کەوتبێ لە قەراخ چۆماندا.

**کەرسەپ** (ئەردە.): کەرەووز.

**کەرسەر**: مەلێکی سوورە بەقەد مراوییەکیە گۆشتی دەخورێ دەنکی وەک زەرەی کەرێ وایە، (ئەردە.) مزراحی قۆرقۆرەی دەستەکی. (کە.) مەلێکی ئاوی و جووانە.

**کەرسەر**: خولخولە، قۆرقۆرە. جوورە مراوییێکە.

**کەرسەک** (هەو.): (هەو.) کەستەک، گلمەت، سندەگل، گلمەتێکی گەورەیە، گلمتک، کرلۆگل.

**کەرسەگ** (کە.): فێڵباز، ساختەچی، کەسێکە بۆ هەندێ چت کەربێ و بۆهەندێ چت زۆرزان بێ.

**کەرسەلە** (باک.): ئاوارە، دەربەدەر، هەرزەگەرد.

**کەرسل** (یەز.): تەرسەقوڵ.

**کەرسمە** (بابا.): (هەو.) کەسمە، دەمار و ئێسکێکە لەناو لووتی وولاخاندا پەیدادەبێ وەکوو لوو وایە دەری نەهێنن چانابێتەوە.

**کەرسۆنە**: مەزرەق، قۆزقۆرە.

**کەرسوون** (باک.): تاوە.

**کەرشین** (ئەردە.): کەسێکە بەدرۆ خۆی کردبێتە نەوەی پێغەمبەر.

**کەرغۆک** (باک.): باڵندەیێکە.

**کەرک** (ڕەوا.): پارچە، کەر، کەرت، لەت، لەتک، ڕستە.

**کەڕک** (باک.): کرکرۆچکەی گوێ و لـووت و شوێنانی تر. (هەکا.، ئاک.) قلووک، پەستەک، فەرەجی. (هەورا.، کۆ.) چەوەندەر. (هەو.، کە.) داری بەرییە،کە بەرنەهێنێ. (هەورا.) مریشک. تەماتەیەکە، کەهێشتا سوورنەبووبێ. سیخمەی بێقۆڵ، فەرەجی بێقۆڵ، قاپووت، (هەورا.) کەرەک، قاپووتی بێ قۆڵ، عابای بێ قۆڵ.

**کەرکاش**: برۆز، جەربەزە. ــ ی: برۆزی، جەربەزەیی.

**کەرکاکەرازۆ**: کەری کەراژۆ، (گەمەیەکە).

**کەرکە**: تەماتەیەکە، کەهێشتا سوورنەبووبێ.

**کەرکەدان** (باک.): گەوج. (باک.) کەرگەدەن. نیمچە دوورگە.

**کەرکەدەنگ**: کەرگەدەن.

**کەرکەرانێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانەیە.

**کەرکەرە** (باک.): گەوج.

**کەرکەری** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**کەرکرن** (باک.): قەرزکردن.

**کەرکۆڵ**: گیایەکی بەهارییە بەقەد بەژنێکی پتر بەرزدەبێ گەڵاکەی وەکوو شوێتی وایە، باریکە بنەکەی ئەستوورە و پانە باشترین کارگ لە کۆلکی وی پەیدادەبێ، بەهاران، کە کەرکۆڵ و ڕێواس سەری دەرهێنا وورچ گیایەکەیان ناخوا دەیکۆڵێ کۆلکەکەیان دەردێنێ و دەیخوا، بە وشکی دەیسووتێنن بە مشکییەکەی لەگەڵ قسڵی سابوونی پێ دروستدەکرێ. گیایەکی گەڵاپانە پاییزییە گوڵێکی شینی درواوی دێنێ گەڵاکەی بکوترێ دەبێتە پووشوو. جاشەکەر، هۆڵی کەر.

**کەرکۆڵک**: کەرکۆل، گیای کەرخۆرەیە قالۆرەکەی زۆربڵنددەبێ و کلۆرە، بەپیری و وشکی گەڵاکەی دەکوترێ دەبێتە پووشوو، بەپووشووەکەشی دەڵێن کەرکۆڵک.

**کەرکوتێن** (باک.): گەوج.

**کەرکۆز** (ئەردە.): ژاڵە، لوورک.

**کەرکووش** (باک.): جوورە ترێیەکە بۆ وشک کردنەوە دیاری کرابێ.

**کەرکوشی**: چتێکە وەکەرکووشی بچێ.

**کەرکوولان** (باک.): کەرەکێوی.

**کەرکووک**: شارێکی کوردانە کەوتۆتە باشووری کوردستان و بەنەوت نێوداره.

**کەرکێت** (خۆ.): شەی تەونییە، (موک.) کەکیت.

**کەرکێش** (هەورا.): بەردکێش، خەرەکی بەردکێشانێ. (دزە.) شوێنی هاتووچۆی کەرییە.

**کەرکی نافێ** (باد.): شەلاقە (باڵندەییێکە).

**کەرکیت** (کۆ.، باک.، موک.): شەی ئاسنینی تەونی. (خۆ.) کەرکێت، هەپک، (هەورا.) کەڵکیت، هەڤۆ، (بۆڵ.) هەپۆ، (سوور.) دەستەک،کەرلیتک، (هەر.) پیشک، (مام.) هەپک، مرازێکە لە شیشەئاسن و یا لەداری پەنجەدار دروست کراوە تەونی پێ دەکوترێ.

**کەرکیتک** (باک.): (باک.) کەرکیت.

**کەرکیکەرازۆ** (باد.): باڵندەییێکی ڕەنگ سەوزە وەکوو ماسیگرە ماسی دەگرێ، دندووکی درێژە.

**کەرگ** (کە.): بزنێکە گوێچکەی سووربێ. (باک.) بارۆکە، مریشک.

**کەرگە** (هەورا.): مریشک، مامر. (باک.) بەرمیل، کووپە.

**کەرگەداس**: دارێکە دەکرێتە کلکی داسی.

**کەرگەدەن**: داعبایەکی زلـە بەقـەد گایەکی شاخێکی لەسەری لووتییە لاق و ملی ئەستوورە، کەرگەدەنگ.

کەرگەدەن

**کەرگەدەنگ** (هەورا.): کەرگەدەن.

**کەرگەز**: کەرگەس، کورت، داڵەکەرخۆرە.

**کەرگەس**: کەرکەز، کەپەنک داڵ، کەپەنەکدار، داڵەکەرخۆرە.

**کەرگەفیسک** (باک.): خیزەلان، جێگایەکە خیزی زۆربێ.

**کەرگەقاز** (هەورا.): کۆخەڕشە.

**کەرگەلاری** (هەو.): باڵندەییێکی بۆری دندووک درێژە لە قژاڵکە گچکەترە.

**کەرگراف**: گراف، نیمچە دوورگە.

**کەرگووان** (خۆ.): ئاژاڵێکە گوانێکی وشک بووبێ. (موک.) بێکەڵ.

**کەرگوە** (باک.): کەروێشک.

**کەرمە** (وا.): کەمرە، پارچەتەپاڵە و شیاکەی وشک بووەوە.

**کەرمۆز** (باک.): مۆز. (ڕەوا.) مێشەگەز.

**کەرمێش** (زا.): مێشەکەرانە.

**کەرمێز**: شوێنەوار. ــ ی لێنەهێشتن: شوێنەواری بڕین.

**کەرواس** (فە.): کراس.

**کەرواڵ**: کەروو، بەڵغ.

**کەروان** (باک.): کاروان.

**کەرواوی**: چتێکە کەرووی هەڵێنابێ.

**کەرۆکە** (هەو.): دووردیواری نزم و گچکەن لە دوولای چاڵاوانەوە داری گرگرە داری لەسەر دادەنرێ. مرۆڤی گێلۆکەیە.

**کەرۆکووک** (باک.): باڵندەییێکە.

**کەرۆڵ** (هەورا.): کەروو.

**کەرۆڵە**: لە زووری دیوی دیهاتاندا لەلای دەرگاوە سەکۆیەکی بڵندە بۆ کەوشان دروستکراوە.

**کەروو**: (دزە.) کەرەکیفە. (خۆ.) کەرەشین، پەرک، کۆڤنک. (ڕەوا.) پشوو، کەری، کەڵەکیف، کەڕ، کیف. (کە.) کەرو، کەرواڵ، کەرۆل، کاکڵەگوێزی کۆنیش ــ دێنێ، چتێکی سەوزی بۆن ناخۆشە لەسەر رووی نان و کولێرە و نیتر، کە شێی بێنێ، نان و یا هەر چتێکی خواردەمەنی بە نەرمی و تەڕی لەسەریەک دانرێ ــ دێنێ.

**کەروو**: کاکڵەموشان، تەونی جاڵجاڵۆکە.

**کەر و کوێر**: کەسێکە نەبیسێ و نەشبینێ.

**کەروولاڵ**: کەسێکە نەبیستێ و نەدوێ.

**کەرووهەڵێنان**: سەرهەڵدانی کەرووە لەسەر چتێک.

**کەرهەنگ**: جوورە هەنگێکە بێ چزوو و بۆرە لووکی بێ هەنگوینە هەمیشە لە پوورەدا شانە هەڵدەبەستێ، جوورە مێشێکیشە وەک فەرەنگمزە وایە.

**کەرهێ** (باد.): کۆکلاش.

**کەروێشک**: هەورێشە، کۆرشک. کوێریشک، کەڤرۆشک. (هەورا.) هەورۆشە، هەورێشە، خەرگۆشە، کەرگوە، (هەو.) شک. (کف.) کەرێشک، کەرویە. ــ ی جحێڵ: خرنک.

کەروێشک

**کەروێشکە**: کێرووشکەکردن، هاتووچۆو جووڵانی سەرلکی داروگیایانە بەدەم باوە.

**کەروێشکەخەو**: جوورە نوستنێکە، کەچاو هێشتا بەتەواوی نەقووچابێ.

**کەروێشکەخەوکردن**: سەری لکی داروگژوگیا و دەغڵی شین، کەبەدەم باوە وەکوو شەپۆلی ئاوی دەهەژێ و دێت و دەچێ.

**کەروێشکەکردن**: هەژانی سەری سەوزایی هەراشە، کە پیاو وە بزانێ لە دوورەوە، کە ئەو سەوزاییە دەڕوات و شەپۆل لێدەدا.

**کەرێ** (هەورا.): کەرە، ڕۆنی کەرە.

**کەرێ** (کە.): مەڕی گووێ کورتە، کەرە.

**کەرێتی**: کەرایەتی، کەریتی، بێ ژیری.

**کەرێشک** (کف.): کەروێشک.

**کەری**: گووێ گرانی، نەژنەوایی، بێ گووێچکەیی. کەری نێری. (هەورا.) کەرووی نانی یا مستی. (باک.) مێگەلێکە لە (٩٠) تا (٢٠٠) سەر مەڕ.

**کەری**: کەرێتی، ڕانی مەڕ، مێگەل. کەرپلە. (زا.) پارچەیێک لە هەموو چتێک.

**کەری بەتەندووره**: تەندووری خراپ.

**کەری ڕێژگاو** (بابا.): کەرێکە تەنها زەرینی هەبێ و پەرینی نەبێ بۆ وێنە بۆ کەسێکیش بەکار دەبرێ، کەهەر قسەی هەبێ و کرداری نەبێ.

**کەری شین**: کەرووی نان و چتی تر.

**کەری سوو**: گەمەیێکی منداڵانە.

**کەری کەرلۆ** (هەو.): گەمەیەکە. واتا کەری و کەریش دەستازۆبێت.

**کەریک**: مریشک.

**کەریل**: گەڕ، بێ گووێچکە. (ئەردە.) کەرپلە، جوورە بزن و مەڕێکە گووێچکەیان قوت و کورت بێ، کەڕی.

**کەرپلە**: گووێ کەڕ. بزن و مەڕی بێ گووێچکە، گووێچکە کورت.

**کەرپن** (خۆ.): مەڕ وبەرانی بە قۆچ و شاخدارە.

**کەری نێری**: هەوەڵ و تەنکە بەفرێکە کەوتبێتە سەرکێوان بەپەیدابوونی وی نێرییەکێیان دەست بەپەڕینێ دەکەن.

**کەز** (زا.، ڕەوا.): قەوزە. (باک.) پەردە، ڕووبەند.

**کەزاخە** (ڕەوا.): چاکەت و کەوایە لە پێستی خەزی.

**کەزاخەبلا**: بڕینی میوە لە بەهاراندا.

**کەزاخستن** (زا.): کزخاندن.

**کەزامزی**: جوورە ئاخەفتنێکی تایبەتییە لە کوردستانێدا بۆ گەمەو بۆ پارازتنی ڕازانی نهێنی بەکاردەبەن تا کەس تێیان نەگا: لە نێوانی هەموو تیپەکانی ووشاندا (ز) یێەکی تێدەخەن وەکوو بڵێی: چووزانیزم واتە چووزانم.

**کەزان** (باد.): قەزوان.

**کەزەب** (باد.): جەرگ، جەرگسووتاو، لە کاتێکیدا بەکار دەبرێ، کە بەهۆی منداڵ مردنێ و جەرگ سووتاوی.

**کەزنەزان**: دارێکی کووێستانییە وەک دارگەز وایە، بەڵام لە چەماندنەوەدا نەرم و شلکە.

**کەزوان** (باد.): قەزوان.

**کەزوانکەلۆنک** (باد.): باڵندەیێکی گچکەیە و دندووکی وەکوو تووی وایە بە قەزوانی دەژی.

**کەزوکووز** (خۆ.): قەوزەی ئاوێ.

**کەزێکوور** (باک.): بەدبەخت (ژن).

**کەزی** (هەو.، باک.، ڕەوا.): پەرچ، (دەر.) گیس، (کەل.) پەلکە، پرچێکەلەپشتەوە هۆنرابێتەوە. بەقەبزەی ئاویش دەڵێن. (باک.) حەسیر. دەمار، شارەگ.

**کەزیانی** (دزە.): چتێکە پان بهۆنرێتەوە، هۆنینەوەی پانە.

**کەزی زەرێ** (باک.): پرچ زێڕین، جوورە گۆرانییێکیشە.

**کەزیلە**: گیایەکی کێوییە گەڵایەکانی باریک و درێژە وەکەزی دەچن گوڵیشی وەهی قەنەفلی دەچێ ڕەنگی گوڵەکەی بەزەردی دەڕوانێ.

**کەژ**: کێرات، قەرەقاچ، قۆزاخەیێکە بەری داری قەرەقاچ، جوورە ئاوریشمێکی خاوی تێدایە وەکوو لۆکە دەڕێسرێ. (موک.) جووان، شۆخ، سپی، لەبەیتی بارام و گوڵندامدا وادەنوێنێ. ئاوریشمی پاک نەکراوی داری کێرات، داری ئاوریشمییە. چیا، کێو، شاخ، کێف. (باک.) سپی بۆ مالاتی سپی بەکاردەبرێ. (باک.) ڕەنگی خەنایی، مەرمز. (باک.) خووار، کورت. (دزە.) ڕەش و سپییەکی تێکەڵاوە. (هەورا.، زەن.، کەل.) کێو، چیا. (موک.) هاڤرۆنگ، هەوا، پشکساڵ، گونەر، مو، هەڵبرینگان، (هەورا.) هەوورەش رینگان، بارانەبران، سامالێ. جوورە چتێکی قاییی جووانی بریقەدارە وەک ئاوریشم وایە، تەنراوێکی درێژکۆڵەی پانە لەسەرووقوونی چیغ و حەسیری دەگرن، کێف هەردەیان. کۆ، کەژاڵ، ئەو کەسەیە ڕەنگی خۆی سپیە و سوورە وسپیە. چتێکە وەکوو جیلی بکشێ، جیل، لاستیک.

**کەژاڵ:** ڕەشێکی کاڵە، کەژەڵ، چاوکەژاڵ، چاوباز.

**کەژوە:** دوو چاوەی گچکەیە لەسەر پشتی وولاخی دادەنرێ بۆ ئەوەی لەکاتی ڕۆیشتنیدا لەسەر ژوورەی یەکێکی تێدا دانیشێ.

**کەژە** (ئەردە.): قوڵنگی فیلەوانانە، فیلی پێ لێدەخورِن.

**کەژەڵ:** کەژاڵ، چاوشین، چاورەش. (هەورا.) سوورهوڵ. چتی بەڵەک.

**کەژەوان:** شاخەوان.

**کەژدم:** کەژدوم.

**کەژدوم:** کەژدم، دووپشک، چزە و پێڵە.

**کەژک:** قەیاسە. (ڕەوا.) ئەوکەسەیە ڕەنگی خۆی سوور و مووی سپی بێ.

**کەژگ:** کەژوو.

**کەژماڵکردن:** هاتنە دەرەوەی خەڵک لە هەموو ماڵێکییەوە و چوونیان بۆ کەژان بۆگەڕان بە شوێن چتێکیدا.

**کەژمێر:** کاتژمێر. (هەورا.) دەم ژمار، دەمژمێر.

**کەژمێرچێکەر:** کاتژمێرساز.

**کەژمێرساز:** کاتژمێرساز. ـــ ی: کاتژمێرسازی.

**کەژۆک:** ئاوریشمی کێوی، لە ئامێدی پێی دەڵێن کێرات، ئاوریشمی کێوی لە دارێکی پەیدادەبێ، کە نێوی کێرۆ، کە دارێکی ڕەشی گچکەیە لە بەهاراندا گەڵایەکی زۆری مەیلەو شین دێنێ و زۆری پێناچێ لەسەر لقێکی کرمێکی دێغدێغی جووان و ڕەنگاوڕەنگی لێپەیدادەبێ بە گەڵای دارەکە دەژی، کەبەقەد جغارەی پاکەتێکی ئەستوور و درێژبوو لەلیکی خۆی قۆزاخەی ئاوریشمی دروست دەکات پێی دەڵێن ئاوریشمی کەژۆک یا کێرات. ناوی نەخۆشییەکیشە.

**کەژوو:** (سوور.) کەژی، قەیاسە، کشە، (کە.) کژوو، قۆزاخ. کەژک، کەژێکە سەروقوونی چیغ و حەسیری پێدەگیرێ. قەیاسە جوورە گوریسێکی پانە و سێ قامک بەرینە بۆ دەسرازەی لانکی منداڵ و پشتێند بۆسەر تەنگەی بار بەکاردێنرێ.

**کەژی** (سوور.): کەژوو. (باک.) پشتێندی ژنان. چتی کێوی.

**کەژی کەران:** کەژەوان، شاخەوان، ئەوانەن، کەبە چیایاندا دەڕۆن.

**کەس:** ئاک، مرۆڤێک. ٢ ـــ : ٢ نەفەر. مرۆڤ (نێرێ یا مێ). مەردوم. هیچ کەس. ـــ نەبوو: هیچ کەس نەبوو. خزم و کەس و کار. بە ـــ: کەسدار، بەخزم و کەس. بێ ـــ : یەکتەن، یەکباڵ، بێکەس، بێ پشتیوان، (باک.) تووکەس، هیچ کەس.

**کەسات:** بێ برەوە، بێ ڕەواج. *

**کەساد:** ناڕەواج، بێ برەو، بێ بازاڕ، هەژار. ـــ ی: ناڕەواجی، بێ برەوی، هەژاری.

**کەساس:** پەرێشان، بێ نرخ، کز، پەست، گیانداری زەبوونی بێنەوا، هەژار. ـــ ی: پەرێشانی، پەستی، کزی، کەنەفتی، هەژاری، زەبوونی، بێنەوایی.

**کەساندن:** حاواندنەوە، دڵنیاکردن، هەڵگرتنی گۆشت بۆ خواردنی لە زستانیدا.

**کەسانێتر:** ئەوانیتر.

**کەسایەتی:** خزمایەتی، خوویشی.

**کەسەر** (سوور.، هەر.): داخ، ئاه، ئاە، ئامنین، هەناسە هەڵکێشان، خەفەت و پەژارە.

**کەسەرباز** (باک.): هیچ و پووچ، وازی وازی. ـــ ی: هیچ و پووچی، وازی وازی.

**کەسەپشت** (لو.): ژیشک.

**کەسەکوور** (باک.): خەمگین، پەرۆشدار.

**کەسەک** (باک.): هیچ کەسێک.

**کەسەلە** (باک.): لاسکی قامیشی و قەڵەمییە.

**کەسب:** پەیداکردن.

**کەسبە:** کسمکارگەل، پیشەوەرگەل.

**کەسبەر** (باک.): کەسێکە چاوی شین و سەوز بنوێنێ.

**کەسپ:** کۆسپە، قوڕەپەستی سەربان، لەسەر قامیش و زەلەوە.

**کەسپک:** شینایی ئاسمان. (زا.) هێلکە شەیتانۆکە.

**کەستانە** (بابا.): گیایەکە.

**کەستەک** (کە.، ڕەوا.، هەو.): گڵمەت، سندەگڵ، کەستک.

**کەستر:** کەسی تر، کەسی سێیەمین.

**کەستک:** کەرسەک.

**کەسخاندن** (زا.): کەزاختن.

**کەسدار:** کەسێکە خزم و کەس و کاری هەبێ، پشتیواندار. ـــ ی: پشتیداری، بەخزم و کەس.

**کەسداندن** (باک.): پاڵشت دان، مەیاندنی خوێن.

**کەسدین** (باک.): مەیینی خوێن.

**کەسرەوان** (باک.): ئاوریشمی، شاڵ، پشتێند ئاوریشمی.

**کەسک:** سەووز، سەوزایی.

**کەسکان:** قەزوانە، کە لەداری بنێشتی پەیدادەبێ.

**کەسکاو** (هو.): سڵقاو، سڵقێکە، کەلە ناو دۆڵا کوترابێ بۆ ناو چێشتی سڵقاو.

**کەسکایی:** سەوزایی، شیناوەردی.

**کەسکە** (کۆ.): کوڕانی، کچ یا ژنێکە کوڕانی بێ، ئافرەتی بێشەرم.

**کەسکە** (باک.): ڕەنگی کەسک.

**کەسکەسۆر** (باک.): کۆلکەزێرینە.

**کەسک و سوور:** پەلکەزێرینە، کۆلکەزێرینە.

**کەسکون:** کەسکوون، توند، تیژ.

**کەسکوون** (ئەردە.): خواردەمەنی توند و تیژە وەک سرکە، کاری، کوژندە.

**کەسکین:** ڕەنگی کەسک، کەسکوون.

**کەسمە:** ئێسکێکە لە هەردووک لا کەپۆی وولاخان دێ. (موک.) نیپلیک. (بابا.) کەرسمە. (ئەردە.) کاسمە، نانەچەورە، کولێرە بەرۆن.

**کەسمەبڕ:** وەردێنەی نانکردنێ.

**کەسناو:** کونیە.

**کەسنەدار:** چتی نایاب، کەکەس نەیبێ.

**کەس نەزان:** نادیار، کەس نەناس. ناوی دێیەکیە لە زۆر جێگایانی کوردستانێدا.

**کەس نەکردگ:** پەرجۆ، (معجزه).

**کەس نەکێڵ:** زەوییێکە شایانی کێڵان نەبێ.

**کەس نەناس:** کەسێکە لە شوێنێکا، کەکەس نەیناسێ: بڕۆ شوێنێکی کەس نەناس، خۆ ت هەڵکێشە پڕبەکراس.

**کەس وکار:** خزم و نزیکان، خزم و خوێش.

**کەسێ** (هەو.): ئەیڕۆ، وەیڕۆ، ئەی قەدکەسێ.

**کەسسێ** (هەو.): کەسێ. ئەیقەد ـــ : ئەیڕۆ، وەیڕۆ.

**کەسی:** یەک کەسی، ئەم دۆشەگە دووکەسییە، ئەم جاجمە یەک کەسییە.

**کەسیتر:** کەسیدی، کەسیدیکە، یەکێکی کە، سێیەمین.

**کەسیرە** (باک.): خراپ. ـــ کرن: خراپکردن. سڕ، سەرمابردوو، گیاندارێکە لەسەرمان کورووژم هەڵاتبێ. ـــ بوون: کرژهەڵاتن لەسەرمان.

**کەش:** کشانی هەندێ چت، درێژبوون، ئەم هەویرەکەشی هەیە. وەرز. (زا.) سەرکردنی گوللەیە بەلای ڕاست یا چەپدا. (هەورا.) کۆهـ، کێو، کێف. خۆشکردنی هەوا لەنێوانی دوو بارانانداا. گۆنەر، کەژ. ئەستێرەی زوحەل، کەیوان. (موک.) زەوییەکە لە پاییزاندا بە ئاوداشتن کێڵانی دێت. (جا.، کە.) زەوییەکی تەڕە، کەکەمێک ووشک بێتەوە بۆ کێڵان دەستبدات. (جا.) جار، چەل. کە لەگەڵ بن بەکارببرێ: باخەڵ و هەنگڵە: بنکەش: بنهەنگڵ، بنباغەڵ.

**کەشاکەش:** کێشەکێش، هەراوکێشە، جڕە، جڕەجڕ، دەردەسەری، سەخڵەتی.

**کەشان کەشان:** بگرە و بەردە و پاڵەپەستۆ، بەنازوفیزەوە.

**کەشاو:** زەوییێکە لەپێش بارانەدا ئاوبدرێ تانەرم بێو بکێڵرێ و بچێنرێ.

**کەشە:** کێشە، هەراوکێشە. (باک.) قەشە. (ئەردە.) جار، چەل، گل. ـــ هاتم: چەندجارهاتم.

**کەشەتی** (باک.): قەشەیێتی.

**کەشەف:** سینیێکی درێژە بۆ ئیستیکان و پیاڵە بەکاردێت.

**کەشەن** (بابا.): شەکەت، ماندوو، بێهۆش و بێ ئاگا.

**کەشەنگ** (ڕەوا.، دەر.، خۆ.): شەکەت، ماندوو، ماندی. هێز، تین، توانایی، ووزە، بڕ.

**کەشەنگی:** ماندوێتی، شەکەتی.

**کەشەنی:** شەکەتی، ماندوێتی. ڕاو.

**کەشەوور:** هەورێکی تەنک و سپییە. کەشەهەور.

**کەشەهەوور:** کەشەوور، تەنکە هەورێکی سپییە، کەشەهەور.

**کەشتێڵەسەرە** (ئەردە.): بەچکەی قومقومۆکە.

**کەشتی:** گەمیەی چکۆڵەیە، پاپۆڕ.

**کەشتیەوان:** کەسێکە کەشتی داژوورێ. ـــ ی: ئاژۆتنی کەشتی.

**کەشتی بادەوەدار:** کەشتییێکە بادەوەی پێوەبێ.

**کەشتی بایەوان:** کەشتییەکە پەردەیەکی بڵند و پانی هەیە بەبای دەڕوات.

**کەشتی جەنگی:** گەمیێ شەڕێ، کەشتی زرێدارە لە شەڕێدا بەکار دێنرێ، زرێپۆش.

**کەشتی چکۆڵە:** بەلەم.

**کەشتی زرێدار:** گەمیێ زرێدار، جوورە کەشتییێکی شەڕییە هەموو لایەکی لەئاسن گیراوە هیچ چتێک کاری لێناکات.

کەشتی چکۆڵە

**کەشتی شکێن:** گەمیێ شکێن.

**کەشتی گا:** مینا، بەندەر.

**کەشتی گەل:** دەستە کەشتی.

**کەشتێلە** (ئەردە.): چەمچە، کەوچکی گەورە.

**کەشتێڵەسەرە:** کەفچلیز، شەرخە بۆقە، کە هێشتا لە ناو منداڵدانیدایە.

**کەشتیوان:** گەمیەوان، پاپۆڕەوان، خەفتان. ـــ ی: گەمیەوانی، کەشتی ئاژۆتن.

**کەشخە:** شانازی، لەخۆبایی بوون.

**کەشخەیی:** بایی بوون لە خۆ.

**کەششە** (زا.): قەشە.

**کەشک:** سەلکە شیرێژی ووشک بووەوەیە، چتێکی مێچۆڵە مێچۆڵەیە لە دۆی خەست دروستدەکرێ.

**کەشکە:** لێدان بە کلاوەی پەنجە لەسەرو کەللە، چەمۆڵە، چەپۆک، کەشکێکی ماڵی بەسەریدا.

**کەشکەڕەشە:** قەرەقرووت.

**کەشکەزەنگوڵ:** بڕوانە: کەشکەزرانی

**کەشکەزرانی:** کلاوەی زرانی.

**کەشکەژنێ** (شکا.، سوور.، بۆتا.): لقلقۆک، خش، سابووقوک. (باد.) کۆڕک، کەشکەلان، کۆزژنیر. (هەورا.) کەشکەزەنگوڵ. (باک.) دەرقیتک. کەشکەچۆک، کلاوەی چۆکی، کلاوەی ووژنک، ئێسکی چۆک، کلاوەی زرانی، کەشکۆی زرانی، کلاوەی ئەژنۆ، کەشکەزرانی.

کەشکەسەر

**کەشکەسەر:** قومقومۆکە.

**کەشکەسەرە:** قومقومۆکە.

**کەشکەشان:** پەرپەرۆچکەی ئاسمانێ، کاکەشان.

**کەشکەک:** کەشکین، هەریسە، چێشتێکە لە سەروپێ و گەغە کوتاوی دروستدەکرێ لە هەندێک شوێنان لە بڕوێش و گۆشت و یا لە کەشکی سووراوەوە و گۆشت دروستدەکرێت.

**کەشکەلان** (کە.): کەشکەژنۆ. شوێنی زۆربەرز، کە دەست نەیگاتێ، دارا لێم چۆتە کەشکەلانی فەلەک.

**کەشکەلانی فەلەک:** پەرپەرۆچکەی ئاسمانی.

**کەشکەڵە:** قشقەڵە.

**کەشکیا** (لوڕ.): کەشکەژنۆ، ئەژنۆ.

**کەشکلینک** (باد.): قشقەڵە.

**کەشکۆزەنگوڵێ** (هەورا.): کەشکەژنۆ.

**کەشکۆڵ:** ـــ ی دەروێشان، دەفرێکە لە کان و زنجیرێکی لە دورسەران دەخەن دەروێش لەدەستی دەکات و سوواڵی پێدەکا و چتی بۆ تێدەکەن. کۆمەڵە هەڵبەستی چەند هەستیارێکییە، کە لە پەڕاوێکی ئەستوور یا تەنک نووسرابێتەوە بەیازیشی پێدەڵێن. بەرمووریکە لە زێڕ یا لە زیو، کەچەند پارچەیەکیشی زێڕ یازێو تێدابێ. جوورە ئامانێکە لە دارە گوێزی هیندوستان دروستدەکرێ و زریزەیەکی تێدەخرێ دەروێشان لە قۆڵیان دەکەن و سوواڵی پێوەدەکەن.

**کەشکۆی زرانی:** کەشکەژنۆ.

**کەشک و سوور** (ئەردە.): چتی سوور و سپی یا سەوز و سوور.

**کەشکین** (باک.): کەشکەک، چێشتێکە بە کەشک لێنرابێ.

**کەشم:** نەشم، چەشن، نیشک، ئازین.

**کەشماکەش:** کێشەکێش، کێشواکێش، گێرە و کێشە.

**کەشمان:** ڕاکێشانی چتێک لە دوو سەرەوە بۆ ئەوەی، کە بکشێ. ـــ هاتن: کێشهاتن، کشان.

**کەشمەکەش:** کێشەکێش. ـــ ی: کەشاکەشی، کێشەکێشی.

**کەشمەکێش:** کێشەکێش.

**کەشم و نەشم:** جوانی و لار و لەنج، عیشوە و ناز.

**کەشۆڵ** (زا.): پاقلەی دێمی.

**کەش و تووش:** شەفتورر، بڕین یا دڕین یا خەتکێشانی چتێک لە گۆشەیێکەوە بۆ گۆشەییێکی تری. کەش و تووشی کراسەکە ببڕە یا لێفەکە تەریب بدە.

**کەش و فش:** هەوا و دەمار و فیزکردن، ئینجە و فینجە، گروفڕ، لارولەنجە.

**کەش و فنگ:** کەش و فش، دەورە، چووارکەنار.

**کەش و کۆ** (هەورا.): کەژوکێو.

**کەشهاتن:** کەشمان هاتن، واتە ووشکبوونەوەی زەوییە بەجۆرێک، کەبکێڵرێ، کزربوونەوە.

**کەشیدە:** پارچەیەکی زەردە بە ئاوریشمی زەرد دەچنرێ و حاجی لەسەری دەبەستێ. خەتێکی ئاوایە (~) بەسەر هەندێ تیپی ئارەوییەوە. (ئەردە.) زللە، شەپەلاخە.

**کەشیش:** قەشە. ـــ ی: قەشەیی.

**کەعبە:** کابە، کۆڕنۆشگە، کۆڕنۆژگە.

**کەف:** کەفی سابوون و ئەسپۆن و چتی ترشاو و لەسەر چێشتی زۆر کوڵاو پەیدا دەبێ، کەفز، کافزێم. (ئەردە.) لەپ، ناولەپ، لەواسە، ـــ دەست: لەپی دەست. قەراغی حاجەت و کەل و پەل.

**کەفاک** (ئەردە.): تۆقەسەری چتی.

**کەفاندن** (زا.): دروونی چواردەوری چتەمەک.

**کەفە:** پەلە، لنگە تەرازوو. بێلکە، بێلچە، ئاسنێکە کورتاندروو لەکاتی کورتاندروونیدا دەیکاتە دەستی.

**کەفەرێژ:** لێورێژ، حەوزەکە یا ئەستێڵەکە ـــ بووە واتە: ئاو بەهەر چووار لایانیدا دێتە خووارەوە.

**کەفەزیکە:** گۆشتی شلی چەرمەچەقاڵتەیە.

**کەفەڵ:** قاڵچە، سمتی گیانلەبەران، لاتریزە، ئەقیزەگاز.

**کەفەڵپۆش:** پارچەیەکە بەزینەوە دەکەرێتە سەرکەفەڵی وولاغ.

**کەفەڵووکە:** کەفی چێشتیێ، کەف و کوڵ. گۆشتی ـــ: چەقاڵتە و کەفە. کەفێکی کەمە لەگەڵ تەڕی تێکەڵ بووبێ.

**کەفەلوولکە:** کەفەژیلکە.

**کەفەن:** کفن، بەرگی مەرگ.

**کەفاندن** (باک.): کفنکردن.

**کەفەندز:** گۆڕکەنگە، گۆڕهەڵکەنە.

**کەفتار** (باک.): کەمتیار. پیرا ـــ: پیرێژن.

**کەفتارۆ** (باد.): کەمتیار.

**کەفتانی:** سەبیلەیەکی دارینی ساکاری سەرخڕی تۆکمەیە تووتنی پێدەکێشرێ.

کەفتانی

**کەفتە** (ئەردە.): کەوتوو.

**کەفتەکار:** مەردومی کەوتووی زەبوون. ـــ ی: زەبوونی، لەکار کەوتنی مەردوم.

**کەفتەیی** (هەورا.): کەوتن. (کە.) ڕەشەگرانەتا، کەوتوویی، یار سەرەمەڕ.

**کەفتن** (جا.، هەر.، خۆ.): کەوتن، بەربوونەوەخووار، نەخۆشبوون، گلیانەوە، داریانەوە. تووشی دەردەسەری و کێشە و کارەسات هاتن. دەرهاتن، وەزین، هەڵهاتن، دەمین، بەرین، خووەر ـــ، مانگ ـــ.

**کەفتنەدڵ:** پەسندکردن، بەدڵداهاتن، لێویان.

**کەفتنەوە:** بێزیان، هەڵکەفتن، لەبەرچاوان کەوتن.

**کەفتن و هەڵسان:** تەپ و کۆ، کەوتن و هەستانەوە.

**کەفتوو** (باد.): کەوتوو.

کەفتیار

**کەفتیار** (ڕەوا.): کەمتیار.

**کەفچاندن:** لە فێهاتنێدا زاری کەف بکاتەوە، بەهۆی تووڕەبوون یا ئازارێکەوە کەف لەزار هاتنە دەرەوە. لەجنێو و هەڕەشەدا کەف دەچێنرێ.

**کەفچەدان** (باک.): قەرتاڵەی کەوچکان.

**کەفچەڕانن:** کەف پەڕانن بە هۆی ڕق ئەستووری یا زۆر بلێییەوە.

**کەفچک** (باک.): کەوچکی چکۆڵە.

کەفچی

**کەفچی** (باک.): کەوچک.

**کەفچیدانک:** کەفچەدان.

**کەفخوێ** (باک.): کەیخودا.

**کەفدەریا:** چتێکی سپیە وەئێسکی ڕزیو دەچێ.

**کەفدەس:** بەری دەستی.

**کەفدەم:** کەفی زار.

**کەفرێژ:** پڕبوونی ئامانێک لە چتێکی شل هاتنە خووارەوەی بە لێوارێدا.

**کەفز** (زا.): قەوزە.

**کەفش:** کەوش، بنهەنگڵ.

**کەفشێف** (زا.): سووڕێنەی کەشک تێدا سوونەوە.

**کەفشیل** (باک.): کەفی زاری، لیکی دەم.

**کەفکانی** (زا.): قۆچەقانی، بەردەقانی، قەڵماسک.

**کەفکەنۆک** (زا.): ئەسپۆن.

**کەفکردن**: پەیدابوونی کەف لەچتێکەوە.

**کەفگرتن**: کەفی ڕووی چێشتێ گرتن.

**کەفگیر**: کەوگیر، ئاوپاڵ.

**کەفلەمە** (ئەردە.): کەپلەمە.

**کەفماڵ**: سوواغ. ـــ کردن: سوواخکردن. سوواخێکە، کە بە دەست لێدرابێ.

**کەفلێدان**: بریتییە لە بردنی چتێک بە ناخونەک.

**کەف و کوڵ**: کەفەڵوکەی چێشتێیەو چتی ترە. ـــ کردن: کەفکردن.

**کەفی** (باک.): پەردەی چەتفەی حەگالانە.

**کەفی دەریا**: هەویرێکی پفەڵە دەم و چاوی پێدەشۆن.

**کەفی زاری**: کلێر، گرێز. ـــ کردن: گرێزکەتن.

**کەفیل**: تەنخووا، جێگەنشین، جادار، جێگەدار.

**کەفیل**: دەستبەر، زامن.*

**کەڤ** (باک.): کەنار.

**کەڤارک** (باد.): کارگ.

**کەڤان** (باک.): فەنەر، کەوان. ـــ ە (باک.): کەوانە.

**کەڤاندن** (باک.): کەواندن، ئیبی تیری بکەڤینە. پێچ و تاوان، ئازار.

**کەڤانژەن** (باک.): هەللاج.

**کەڤانۆ** (باک.): پێشکار، سەرکار.

**کەڤانی** (باک.): کەپانی.

**کەڤە**: کێوێکی بالاّبەرز و بڵندە.

**کەڤەر** (ز.): بزنی بەڵەک، کێو.

**کەڤەڵ** (باک.): پیست، کەوڵی ئاژاڵ.

**کەڤتک** (زا.): دەسرە، سەرپۆشی ژنان.

**کەڤچک**: کەوچک. (باد.) گیایەکە لەناو دۆو دۆینە و ژاژی و پەنیری دەکرێ.

**کەڤر** (باک.): بەردێکی گەورە، گاشە. ـــ ێ بوهادار: بەردی نرخدار. ـــ ێ سنووریێ: بەردی سنووریێ.

**کەڤرازێر** (باک.): بەردی چەخماخی.

**کەڤرتاش** (باک.): بەردتاش. ـــ ی: بەردتاشی.

**کەڤرقوڵپتی** (باک.): ناپایەدار، بێقەرار.

**کەڤرکانی** (باک.): قۆچەقانی.

**کەڤرۆشک** (باک.): کەروێشک.

**کەڤز** (باک.): (باک.) کاڤزیم، کەفی چتانی شل.

**کەڤزان** (باک.): دارێکە.

**کەڤس** (زاخ.): قەوزەی نێوئاوییە.

**کەڤشک** (باک.): کرێژی سەرییە، تۆشکەی سەرێکییە، کە کەچەڵ نەبێ.

**کەڤک**: کەوچک.

**کەڤکنۆک** (باک.): قۆچەقانی.

**کەڤکانی**: قۆچەقانی، سەری بەردەقۆچەقانی.

**کەڤگیر** (باک.، لو.): کەوگیر.

**کەڤل** (باک.): کەوڵ.

**کەڤلاندن** (باد.): کەوڵکردن.

**کەڤلکرن** (باک.): کەوڵکردنی گیاندار.

**کەڤن** (بابا.): کۆن.

**کەڤنار** (باک.): کۆن، ئەنتیکە، بێکەڵک، چتی زۆرکۆن. کۆن، عەنتیکە.

**کەڤنارە** (باک.): کۆن، عەنتیکە.

**کەڤندار** (باک.): زۆرپیر بۆ پیاو.

**کەڤنەژن**: کۆنەژن.

**کەڤنەشۆپ**: داستان، قەواتی، چیرۆک.

**کەڤنەفرۆش**: کۆنەفرۆش. ـــ ی: کەونەفرۆشی.

**کەڤنەگیر** (باک.): کۆنەفرۆش.

**کەڤنەگیری**: شڕەگر.

**کەڤنک** (باک.): پێچێکی چکۆڵەی سەرییە.

**کەڤۆت** (باک.): داری کەوێت، کەوت. داری عوود.

**کەڤۆخووێ** (باک.): خاوەنددێ، کوێخا.

**کەڤۆک** (باک.): گاکۆترە، کۆترەکێویلە.

**کەڤۆکوورک** (باک.): قومری.

**کەڤوت**: کەوت، کەویت، جوورە دارێکە.

**کەڤی** (باک.): کەویە بەفر. (یەز.) ڕنووە بەفرێکە بە زۆری بەسەر یەکتریدا کەوتبێ. (باک.) کەنار، لێواری دەریایان.

**کەڤیس**: مەرێکە سەری زەردبێ.

**کەڤیتک** (بابا.): جامەدانی سەر.

**کەک**: گەورەی ئاوەدانی، کوێخا یا ڕیش سپی. (باک.) کاک. باب، باوک. (کە.، هەورا.) کێچ، (هەورا.) کەکی.

**کەکەو**: کەووت.

**کەکەیی** (هەورا.): کێچ.

**کەکرە**: تاڵە، تاڵوو، گیایەکە، جوورە خەیارێکی کێوی زۆرتاڵە، گووژاڵک، کاڵەکەمارانە.

**کەکلێ** (هەورا.): کرمی ئاوریشم.

**کەکلی** (هەورا.): کەوی باڵندە، ژەرەژ. (هەورا.) چیل.

**کەکۆ**: کاکە، ئاغا، بەگ.

**کەکی** (هەورا.): کێچ.

**کەکیدووڕێز** (باک.): گەمەی مندالانە.

**کەڵ:** چتی لاشکاو. (باد.) لک، کەد. (باک.) کەڵ. فەرمان، کار. ـــ و کارم نیە. (باک.) شاخدار، مەڕێکە دووشاخی هەبێ. (باک.) کەرین، چتی زۆرگەرم. کەلەبەر، کۆلاو. کەڵک، سوود. بەرانی شاخ گچکە. (موک.) کەسێکە یەک یا چەند ددانی کەوتبێ، کەلۆس، کولۆوکۆم. چتێکە پارچەیێکی لە لێواری لێ بوو‌بێتەوە. (هەورا.) پەچەی ئاژاڵ. (هەورا.) ئاسۆ، سەربستوو، سەری چیا و سەرەکی بڵندایی، بەرزاییێکە، کە لەپێش، هەورازێکی بڵندە، کەخۆی ئاسۆیە، وەکو کەلی خانە. شاخ وبڵندایێکە ڕێگای بەسەردابچێ لەمله گەورەترە. (باک.) قەلاتی قایی لەشکری. (باک.) کڕێژی سەری کەچەلان. کولان، کەلەک لێکەت: ڕاکە، کە قولتێکی داهەلیگرە، کەلاوی ڕابوو: ڕقم هەستا.

**کەڵ:** نێرەی گامێشییە، (باک.) کەل. بەکەڵ: بەفاڵ. نێریەکێوی، ئاسکی نێر، نێری بزنەکێویان، نێریەکێوی بۆ ڕەشەوولاخانیش بەکاردەبرێ. (فە.) ئاسک. (موک.) زل وبەدیمەن، کەڵەپیاو، کەڵەگا.

**کەلا:** مەڕمەڕی گەورە و گچکە (کەللا)، کەتیری پێ بگرێ. کلا، جگی گەورەیە. چتێکە کەوتبێتە کەنارەوە.

**کەللا:** کەللای جک و مەڕمەڕێ و ئیتر.

**کەلائەنگوچک:** ئەنگوچک، فەقێیانە.

**کەلابەرد** (خۆ.): مەڕمەڕ.

**کەلات** (باک.): قەلات.

**کەلاتی:** چەند خانووێکە، کە لەسەر شووێنێکی بەرزکرابێ، دێیەکی گچکەیە لە جێگایەکی بڵندکرابێ.

**کەلاج** (زا.): مەردومی دووڕووی بوختان کەرە.

**کەلاخ** (باک.): کەلاکی تۆپیوی وولاخ و ئاژالانە. (زا.) گیانداری لاواز.

**کەلار** (شار.): تووتنی ووشکە بەشیشەوە، کەلەسەر یەکتری دادەنرێن وەکو خەرمان. ناوی دێیەکیە لە ناوچەی کفری. کومەڵگا بۆ داهات. (ڕەوا.) لاواز و بێزەوەر بۆ گیان لەبەران.

**کەلارە:** کەللارە، قەرتاڵەیێکە لەڕیخ دروستدەکرێ، خشت وخاڵی نێومالی تێدەکرێ. کاسەی شکاو، سووا لەت. دیوارێکە نزم لە تەپالە دروستدەکرێ ژنان نانی تێدادەکەن.

**کەلاس** (زا.): لاشەی مندارەوە بووە.

**کەلاش** (کۆ.): کەلاک.

**کەڵاش:** کلاش، (هەورا.) کەلەش. ـــ چنین: بنپەرگ.

**کەڵاشەکردن:** کلاشەکردن.

**کەڵاشتن** (باک.): قەلاشتن، قەلەشتن.

**کەڵاشچن:** کەسێکە کەلاشی بچنێ. ـــ ین: چنینی سەری کەلاش.

**کەڵاشدوم** (کۆ.): دووپشک.

**کەڵاشکەر** (کە.): کەلاشکەر.

**کەڵاف:** کەلافی دەزوو و ئیدیکە، کلافە، گەوزاڵە. ـــ ە: کلافە.

**کەڵافەت** (ئەردە.): قەلافەت، تووز، تەشک.

**کەلاک:** بەراتە، (باک.) کەلاخ، کەلاش، کەلەخ، کەلەش، لاک، لاشە، لاکی مندارەوەبوو. زەوی، دەشت.

**کەلام** (هەورا.): خەرمانی دەغڵ و دان یا گزروگیا.

**کەلاگری** (باک.): کوڵی گریانێ.

**کەلان:** کێلانی خەنجەر.

**کەڵان** (ئەردە.): چتی گەورە، زل، مەزن.

**کەڵانە:** کلانە.

**کەلانە** (هەو.، کە.، موک.): نانێکە بەهەویری پڕەکرێ لەووردە پیواز یا گۆشتی ئەنجراو و سیر دووای برژانی لە نێو ڕۆنی دا شەتڵ دەکەن. (هەورا.) گێلاخە.

**کەڵانتەر:** کاربەدەستی ئاوایی، گەورەی گەڕەک. ـــ ی: ناوچەی کاربەدەستی ئاوایی.

**کەلاندن** (باک.): کولاندن، وێرانکردن.

**کەلانگووچک** (کۆ.): ئەنگوچک.

**کەلاو:** کەلانگوچک.

**کەلاوە:** خوڵەکەوان، خراوە، کاوول، خەرابە، قافی، کەمیل، وێرانە، کەیلەکۆن، خانووی ڕووخاو و وێران، کەلین. کەڵەوەی جووتی.

**کەلاوێ** (هەورا.): لغاوەی زاری مرۆیانە.

**کەلایانێ:** هەڵماتێن.

**کەللای مزدار:** جگی گەورەی مزدار. (هەو.) دەق.

**کەلایێن:** کەلایانێ.

**کەلایی:** کەلی چت.

**کەلە** (هەورا.): ئاسووکە لەمله بڵندتربێ، سیلەیەکی زەوییە لە نێوانی زەوی و ئاسمانێدا وێکهاتۆتەوە. (باک.) بێمەزە، بێخووێ. (دەر.) قامکەگەورە. قەلەفڕ، کەمە.

**کەللە:** ـــ ی سەر، کاژەڵەی سەر، قاڵکا سەری.

**کەڵە:** گورگە، گیایەکە.

**گەڵە:** گووێدان، گووێ ڕاگرتن.

**کەڵە** (کە.): قامکە گەورەی دەست و پێیانە. گەورە، مەزن. (گەر.) ئەوبرنجەیە دانەی ساخ بێ بۆ پلاوێ و بێ ووردەبێ. (موک.) سیرکەڵەکا. (ئەردە.) کۆمە، کۆما، کۆمەڵە.

**کەڵەئاسک** (کە.): نێریە ئاسک.

**کەڵەئەنگوست:** قامکەگەورەی دەست و پێیان.

**کەڵەئەنگوشت:** قامکە گەورەی دەست و پێیان.

**کەڵەئەموست:** قامکە گەورەی دەست و پێیان.

**کەڵەبا:** کەلەباب.

**کەڵەبەب:** چیلە، کەڵەشە، دیقل، قالک، (ح.، شکا.) دیکل، کەلەکووک، کەڵەبا، کەڵەباڵ، کەڵەشێر، (ئەردە.) کەڵەشین.

**کەڵەببە:** کەڵەبابەی گەردن. بڕکی ـــ ی گرتووە، بڕکەبڕکە.

**کەڵەببەکێویلە:** کەڵەبابی کێوی، جوورە باڵندەیێکە.

**کەلەبال** (باک.): کەڵەباب.

**کەلەبەر** (هەورا.): کەلێن، دەرفەت، بۆسە. قەوارە، کونێکە لە دیواربکرێ، کە دزییکا یا ڕووخابێ، کەل و کۆلاو. ڕێگایەکە لە نێوانی

دوو دیواران یا دووپەرژینان یا دووتـاواندا. کونێکی گەورەیـە لـەدیوار لەوانە بێ هاتووچۆی پێدابکرێ.

**کەلەپاچە:** سەروپێ، کەلەپەرچە، سەروپێی ئاژاڵی سەربڕاو.

**کەلەپاچەکردن:** مەبەس لەشەق و پەق کردنی گیانداره.

**کەلەپەرچە** (باک.): کەللەپاچە.

**کەلەپچە:** ئاسنێکە دەکرێتـە دەستی بەندییانـەوە، بەلەچکـە، کەتـەن، کەت بەسە. ــ کردن: هەردوودەستی بەندی لە کەلەپچەکردن.

**کەلەپشکۆ:** پزڵووە ئاوری گەورە.

**کەلەپوور:** ئەو چتانەیـە، کە لـە مـردوو بـە جێ دەمێنـێ بـۆ کـەس و کـار، میرات.

**کەڵەپیاو:** پیاوی گەورە و زەلام، کەڵەمێر.

**کەڵەپیتاک:** چتێکە ئاغا لەژێردەستانی خۆی دەسـتێنـێ سـاڵـێ جارێکی یا پتر لەکاتی دەستکورتی و پێداویستیدا.

**کەلەتەتر** (کە.): بناغەی چرووک.

**کەلەخ:** کەلاکی گیانداری مندارﺑووەوە. (باد.) لەشی مردوو، کـەلاک. (رەوا.) برینگی مالاّت برینەوە، (خۆ.) چەو.

**کەلەخان** (کەل.): هۆڵی مەران.

**کەڵەدار:** لکەدارێک سا ئەستوور یا باریک بێ.

**کەللەرەق:** براندۆغ.

**کەلـەرم** (هـەورا.): کەلـەم، گیایـەکی گـەلاّپانی خـڕی پێچـراوەی کوێستانیە دەکرێ بە دۆڵمە.

**کەلەرم قومری** (ئەردە.): داشکەلەم.

**کەڵەز:** دەمی تێبەربوونی بەرانە کێوی.

**کەڵەزەری:** زۆری، تۆپزی، زۆرەملێ. بە ــ: بە زۆری، بەتۆپزی.

**کەلەزووسک** (باک.): داماڵین، دەست پێداهێنان، خوراندن.

**کەڵەز:** قایەی مێوی، بەدارێکی دوولکیش دەڵێن کەوەژێر دوولکـان دەدرێ.

**کەڵەزەی پشتی** (شا.): برِبرِەی پشتی.

**کەللەسەر:** کاسەی سەر.

**کەلەس** (رەوا.): کرمێکە لە میوەی گەلاز و سێوی دەدات.

**کەڵـەس:** گوریسـێکە بەسـەرناوێکی زۆردا رادەنگێـورێ لەهـەردووک سەران قـایم دەکـرێ تـارێبوار دەسـتی پـێ بگـرێ و پێیـدا بپەرێتـەوە، کەڵەک.

**کەڵەسوو:** مانگا و گامێشێکە، کـە لـەبەر زۆر لێپەڕینی کـەڵ هەراسان بووبێ.

**کەڵەسووار:** شاسوار.

**کەڵەش** (ئەردە.): کوڵۆش، مەردومی بێعاری بێ ئابڕوو. (باد.) بـەدەن و لـەشی زیندوو. (هەورا.) کەلاک، کەلاش، جـەندەک. کـەلاش. کەچەڵ، گیـانداری زۆرجوان. (باک.) جوان، ئـازا، گـەورە، ئـافرەتی جـوان. پیاوخراپ، جەردە، رێگر.

**کەڵەشاخ:** ــ ی رژنی سەپانان، چەوری دان، رژندان، شاخی کەڵـەرژنی تێدەکەن بـۆ چەورەسـان، ئەسـرۆچلک، ئەسـرۆلک، پـاکێش. ــ گرتـن: خوێنبەردان، بەکەڵەشاخ یا بە پیاڵە خوێنگرتن یا با لە لەش دەرکردن.

**کەڵەشە** (باد.): کەڵەباب.

**کەللە:** کاژەڵەی سەر.

**کەللەشەکر:** قەند، کەللەقەند.

**کەللە:** کەللا و جگی گەورەیە، شاجگ.

**کەڵەشێر:** کەڵەباب.

**کەللەشەق** (جا.): کەللەرەق، تووڕە.

**کەڵەشێرە:** چتێکە لە وێنەی کەڵەشێر لەسەر کورتانی وولاّخ بـۆ جووانی دروستدەکرێ.

**کەڵەشێرەجەنگێ** (ئەردە.): کەڵەشێربازی، شەرە کەڵەباب.

**کەڵەشێرباز:** کەسێکە حەزی لـە شەرە کەڵـەبابێ بکـات. ــ ی: حـەز لەشەرەکەڵەبابێ کردن، شەرە کەڵەشێرکردن.

**کەڵەشێر پێغەمبەر** (فە.): پەپووسلەمانکە.

**کەڵەشین:** کەڵەباب.

**کەلەف:** کەلاّفە.

**کەلەفر** (کف.): هەوێردە.

**کەڵەفنە:** باڵندەیێکی زۆرگچکەیە رەنگی بۆرێکـە بـە قـاوەیی دەڕوانی دوو جوورە دەنگی هەیە هەرلەناو پەرژینی باخچاندا دەژی.

**کەلەقەند:** کەللەشەکر.

**کەلەک:** کەڵەک. قولاّخەی کەووش.

**کەڵەک:** دیواری قەراغ باغ و باخچە و گۆڕستانانە، کە بە ووشکەبەردی بڵندکرابێ، گۆجار، ئاغەڵ. ــ ی ووردەبەردان: گۆجار، ئاغەڵ، شـکار، شکێر، کووچ، کۆمەڵەبەردێکیشە لە زەویدا کۆکرابێتەوە. ــ ی سەراوێ: چەند دارێکـە لـێک دەبەسترێن بەچەند کوندەیـەکی گـەورەی فـوودراوەوە لەنێوئاواندا پێی دەپەڕنەوە و هاتوچۆی پێدەکەن. ساختە، رووشە، کێشە، گێچەڵ، رەتم، فێڵ، تەفرە، ریوم، حوققە، داو. کەڵەکە، لـەسەر یـەکتری کۆبوونـەوە. دیـواری بـەردە، کەبەووشکی هـەڵچنرابێ. ــ ی بـەردان: کۆمابەردێک.

**کەلەکە:** خاڵکە، قەد، پۆتەکە، لاپەراسوو، خاڵیگا، (هەورا.) پاڵوو، نەووک. کێلەک، تەنیشتی گیاندار لـە ژێر دەستیەوە تا ژوور کوڵۆتی. کاسەی کەل، کە ئاوی تێدەکرێ بۆ مریشک و سەگان. سووالّەت.

**کەڵەکە:** ئاژلوە، ئاژاوڵە، کەرەسیسە، کۆبوونەوە و بەسەریەکداکەوتن، بانیەک. تەڵەکە.

**کەڵەکەبەرد:** ئاغەڵ.

**کەڵەکەبەستن:** خڕبوونەوە و کۆمەڵ بوونی گیاندار.

**کەڵەکەبڕێن** (موک.): گەمەیەکی منداڵانە.

**کەڵەکەبوون:** کەڵەکبوون.

**کەڵەکەتریّ:** خۆبەسەریەکتردادانی چەندکەسێک.

**کەڵەکەکردن:** چەندکەسێک چتێک یا کەسێکی کۆبونەوە، کەڵەک کردن.

**کەڵەکەکل** (باد.): چرقەچرقی گەرمایە.

**کەڵەکەڵ:** ووشەیەکە بۆ هاندانی کەڵەگایە بۆ ئەوەی بپەڕێتە سەر مانگای بەکەڵ و گژە و ئیتریشی پێدەڵێن.

**کەڵەکەڵە:** ووتەیەکە کەڵەگای پێهاندەدرێ بۆسەرمانگابەکەڵان.

**کەڵەکەوان** (باک.): کەڵەکوان، کەسێکە کەڵەکی لێبخوڕێ. ــ ی: پیشەی کەڵەکەوان.

**کەڵەکەی بەرسک:** کەڵەکە.

**کەڵەکباز:** فێڵباز. ــ ی: فێڵبازی.

**کەڵەکبوون:** بەسەریەکتریدا کەوتن و کۆبونەوەی چت.

**کەڵەکچێتی:** ساختەچێتی، کەڵەکەوانی.

**کەڵەکچی:** ساختەچی، کەڵەکەوان.

**کەڵەکردن:** بڕوانە: کەڵەککردن.

**کەڵەک کردن:** کۆکردنەوەی چت و خستنەسەریەکتری. فێڵ کردن.

**کەڵەکۆتک:** کاسەی کەل.

**کەڵەکووک** (نەم.): کەڵەباب.

**کەڵەکووی** (هەورا.): نێریەکێوی.

**کەڵەکیوی:** نێریە مەڕو بزنە کێوی.

**کەڵەکێف** (هەو.): کەڕووی نانی، ئەو کەفشە، کە لەسەر سرکەو چتی تر دەنیشێ لەکاتی خراپبوونیدا، (بابا.) پرک.

**کەڵەگا:** کەڵۆت، نێرەگای بەگون، نێنگوینی نێری نەخەساوی دروسالانەیە جووتی پێ نەکراوە و بۆتۆو ڕاگیراوە. بێداد، زۆردار، قاندڕ. ــ یەتی: کەڵەزەڕی. ــ لێکردن: کەڵەزەڕی لێکردن. ــ یی: خودسەری.

**کەڵەگەت:** بالابڵند، بالابەرزە، بەژن بڵند. ــ ی: بالابڵندی.

**کەڵەگری:** کوڵی گریانێ، کە گەرووی بگری. ــ بوون: (باک.) کەڵەگرین.

**کەڵەگی** (کۆ.، بابا.): جووره ژوورێکە دەرگای کەوتبێتە نێو پێشخانە، ژووری تەنیشت هەیوان.

**کەڵەلا:** کەسێکە برینێکی گەورەی بەجەستەیەوەبێ، بریندار، خووێناوی.

**کەڵەلابوون:** لەش برینداربوون بە برینێکی گەورە.

**کەڵەلاکردن:** بریندارکردنی جەستەی گیاندار بە زامی زل.

**کەڵەلان** (ئەردە.): بەرموغارە و بن کاچ جێگای نوستن و حاوانەوەی کەڵەکێوییە، غار، ئەشکەوت.

**کەڵەم:** کەلەرم، قەڵبەی داروچێتر. (باک.) داعبایەکی کلک جنجڕ و درێژە. خەڵفی داری. گیایەکە وەکو قەڵەم وایە ووشک دەبێ کورت و سەرتیژە.

**کەڵەم:** کەڵەوەی جووت.

**کەڵەماسی:** ماسی نێرە.

**کەڵەمە:** ڕووشە، کیش، کارەسات. چەڵەمە، چاتڵە، چاڵمە. (جا.) کەڵەوە، داربەڕوویەکی چەماوەوەیە لەملی گایان دەکرێت، کلاوەی جووتی ئەوداره چەمبەرەیە بە نیرەوەیە دەخرێتە ملی گاجووتانەوە، دارکلاوە.

**کەڵەمەشکێن:** یاخی، سەرپێچ، ملهوڕ.

**کەڵەمەکردن:** کەڵەوە لە ملی گاجووت کردن، مەبەست لە ژێردەستکردنی گیاندارێشە.

**کەڵەمبوهار:** داشکەلەم.

**کەڵەمستانێ:** گەمەیەکی منداڵانەیە.

**کەڵەموست:** قامکەگەورە.

**کەڵەملە** (کە.، دەر.): زینوو، شاخێکی نەوییە.

**کەڵەملە:** ئاسو، سوو.

**کەڵەمۆری** (زەن.): کەڵە مێروو.

**کەڵەمۆک** (باک.): سینگی ئاسنە یا دارە.

**کەڵەموست:** کەڵەنگوست.

**کەڵەمێر:** پیاوی دەمڕاستی ئازای دەرهاتوو.

**کەڵەمێردو:** شامێروو، کەڵەمۆری، مێروولەی گەورەی لۆقن.

**کەڵەمێروو:** مێرووی زەلام.

**کەڵەمێش** (زا.): مێشوولە.

**کەڵەن:** کەلێن، کەمین.

**کەڵەن:** کەڵەم، کەڵەمە، چەڵەم، چەقەمە، تۆقی ملی سەگی یا گای.

**کەڵەنج:** یەکێکە لەبەری دارەمازوو وەکو چەکەی هەللاجییە، بەلام کلکی نییە.

**کەڵەنتۆ** (باک.): داس.

**کەڵەندین:** کۆمەڵەبەفرێکە، کە لەبان ماڵینەوە مابێتەوە وکۆبووبێتەوە.

**کەڵەوانە:** کلاتە.

**کەڵەوە:** دارکەڵەمە، کلاوە.

**کەڵەوەر** (جا.): دەرگا، کەلەبەر، دەرکە، کونێکە لە دیوار کرابێ بۆ دز و پیاوخراوان.

**کەڵەوەڕەشکردن:** ڕەشکردن: مەبەس لە دزی لێکردنە.

**کەڵەووران** (کە.): کۆمەڵەی کەڵەگایان.

**کەڵەوێ:** گیایەکی گەلاپانی بەرزە درکەکەی درووێکی تیژ دەردەکات.

**کەڵەهەرز:** کاتی تێبەربوونی بەرانە کێوییە، کە نێرەکانیان وەکوو شێتیان لێدێت.

**کەڵەهێڕ:** کۆبوونەوەی کەڵەگای زۆر بۆ سەرمانگابەکەل.

**کەڵەبێژنگ:** کەمەی بێژنگ، کەوە.

**کەڵەهێڕکردن:** مەبەس لە کەڵە کۆمەگی چەند کەسێکییە لەیەکێک.

**کەڵەی سەر:** کولۆخ.

**کەڵەیی** (باد.): کەڵەم.

**کەڵب:** کولۆی شەکر.

**کەلبە:** دووددانی درێژی سەگ و گورگ و پشیلە و شێر و پڵنگ و بەراز و نێترە. (کە.) ددانی ناوەندی، ددانی عەقڵی. ــ کان: کاکیلەکان،

چوارددانی درێژ و تیژ و بەهێزە لەددانی پێشەوەی هەندێ گیاندار دووانیان لەسەرەوەیە و دووانیان لەخوارەوەیە و چوارددانی گچکەتریان لەنێوانیدا هەیە.

**کەڵبە:** تەقڵە، هەنجیری کاڵی نەگەیشتوو.

**کەڵبەز:** قەڵبەزە.

**کەڵبەزین:** قەڵپووزی زین و ناوکۆڵی زین.

**کەلبەتەین:** گاز.

**کەلبەش:** گیایەکە گەڵای وەهی کەنگری دەچێ قەراخەکانی دڕاوییە و پەڵەپەڵەوخاڵخاڵی سپی تێدایە، کەمەر زۆری حەز لێدەکات، نێوی گەڵایەکانی خونچەیەکی سپی تێدایە.

**کەلبەشی:** ئایینێکی نوێیە لەسەر بنچینەی لیێ ووردبوونەوە و پیتۆڵی مەلارەسوولی تەدیب دامەزراندوە، کەڵبەش واتا کەڵی بەش، یەکێک لە مریدەکانی مەلارەسوولی، کەمەزۆر برەوی بەو ئایینە داوە کەڵێکی بەشی بووە، چونکە کابرا بە کەلبەشی ناونراوە ئایینەکەشی هەر بەوناوە ناوبانگی پەیداکردووە، لەکوردستانێدا باوە کەسێکی مانگایەکی مردبێ پێیان کوتووە مانگامردوو.

**کەلبەی زین** (ئەردە.): قەڵپووزی زین.

**کەڵپ:** کەڵبە. ددانی سەگ و بەراز، (باک.) قیل.

**کەلپ:** کلۆشەکر و ئیتر.

**کەلپاندن** (باک.): چڵکن بوون.

**کەلپە** (باک.): دەنگ. تێکوڵی زۆرتەنک.

**کەڵپە:** کەڵپە.

**کەلپەترە** (ئەردە.): هەڵیت، هەڵیتوپەڵیت، وڕاوە، قسەپەڕاندن.

**کەلپەشەکر:** کولۆشەکر.

**کەلپتاندن** (باک.): تێکوڵ لێکردنەوە.

**کەلپتین** (باک.): تێکوڵی لێکراوەوە.

**کەلپک** (باک.): دەنگی ناسک، کرتە. کەلپ، کەپ.

**کەڵپک** (زا.): کەپەک.

**کەڵپۆس** (ئەردە.): پێستەیەکە توکەکەی پێوەمابێ و خۆشکرابێ بۆلەسەردانیشتنێ، کەوڵی بزنی.

**کەلپووس:** کەوڵ، پێستێکە بەبن قاپووت و عابا و چتی واوە دەدرێت.

**کەلپۆنەمان** (ئەردە.): کەلک پێوەنەمان.

**کەلپیچ:** کەرپووچ، خشتی سوورکراوەوە.

**کەلجەری:** خوێندەواری، ڕەوشەن بیری.

**کەلخستن** (ئەردە.): لەکەلک خستن، پێداویستی.

**کەلخوت** (خۆ.): کەرەستەی کۆن و لەکارکەوتوو.

**کەلخووێ** (باک.): ئارەقەیێکی زۆرکردن.

**کەڵدان:** لێنیان، لێپەڕاندن، پەڕاندنی گا لە مانگاو کەڵ لە گامێش، کێشان، لێکێشان.

**کەلدر** (بابا.): (بانە.) دیپیلە، جوورە هەرزنێکە.

**کەلرەم** (فە.): ڕەوەی ئاسکان.

**کەلشتە** (باک.): قەڵەشت.

**کەڵفیچ:** کەسێکە ددانی پێشەوەی کەل بووبێ و باش قسەی بۆنەکرێ.

**کەڵک:** قەلاتکار، فەلھیت.

**کەلک:** پێداویستی، کار، فەرمان. (باک.) قەرتاڵەی گچکە. گیایەکە. ـــ بردن: قازانج کردن، بردنەوە، سوو، سوود، بارە، کەلک، دەرامەت، قازانج، بەھرە، (باک.) کێر، بەرخوەر. بە ـــ: پرێژ، دابەر، کەلکدار، پڕسوود، بەردار. بێ ـــ: بێسوود، چەپەرک، شەخرە، بێخێر.

**کەڵک:** باڵندەیێکی سپییە پتر لەکەنار ئاوی چۆمان و دەریایاندا ڕاوێدەکات باڵندەیێکی ئاوی و سپییە لەقازی گەورەترە گۆشتی دەخورێ و زۆرچەورە وەکۆتری دەچێ، سەقاقوش. گوێسوانەیە، سەربان.

**کەلکە** (ئەردە.): سووالەت، کاسەی کەل.

**کەلکەپاسار:** پاسار.

**کەلکەل:** گەرمایێکی زۆربەھێز و بەکەلکە، (باک.) ئادان.

**کەڵکەڵە** (ھەورا.، جا.): ھەواو و ھەوەس، سەودا، ئارەزوو، خولیا، دڕاوە، خولیا کەوتنەسەربۆچتێک.

**کەڵکەڵوان** (ھەورا.): کوندە، بەڵام زۆر گەورەیە سەری بەقەد سەلکی پشیلەیە.

**کەڵک تێکەوتن:** پێویست بوونت بەیارمەتی کەسێکی.

**کەلکدار:** بەسوود، بەکەلک، دابەر. ـــی: بەسوودی، بەکەلکی، دابەری.

**کەلکردن:** پەل کردنی چت، گوێچکە کەلکردن، گوێ بڕین.

**کەلک گر:** سووددار.

**کەلکگرتن:** قازانج و سوودگەیاندن بە یەکێک.

**کەلک گری:** کەلک گرتن.

**کەلکگیری:** قازانج لێدیتن.

**کەلکیت** (ھەورا.): شانە، (ھەو.) دەستە، شیشەی ئاسنی تەوون کوتانێیە، چتێکی دەسکدارە شانەی ئاسنی تێ براوە وەک پەنجەی دەست تەونی پێدەکوترێ بۆ سفتبوونی.

کەڵگا

**کەڵگا** (شوا.): گا، کەڵی گامێشان.

**کەڵگە:** ئاورشکێنە، شوێنێکە لە جۆگەدا ئاوی لێوە لادەدرێ بۆ سەرکشت و کاڵ.

**کەڵگەی بەرسەگ:** کاسەی دەرزەکەرو ئەو سووالەتەیە، کە بۆمریشکان ئاو و دانی تێدەکەن.

**کەڵگو** (فە.): گا.

**کەڵگرتن:** ئاورسبوونی مانگا، فاڵگرتن.

**کەللارە:** کەلارە، سەبەتەیەکی گەورەیە لەشیاکە دروستدەکرێت بۆ زبڵ و تەپاڵە و چتیتر.

**کەللای مزدار:** جوورە کەللایەکە مزی تێکرابێ بۆ قورس و تینی.

کەللە: ـ ی سەر: سەلکی گیاندار، کاژەڵەی سەر، قالکاسەری. قسڵی کوڵۆ. کەوە.

**کەللەبا** (ئەردە.): مرۆڤی کەللەرەقی خودسەرە، سەرکێش، بەفیز، بەھەوا. ـــ یی (ئەردە.): خودسەری، بەفیزی، بەھەوایی.

**کەللەبێژنگ:** کەوەی بێژنگ.

**کەللەپاچە** (هەورا.): سەروویێ، کەلەپاچە، بە چێشتەکەشی هەر دەڵێن: ــ .

**کەللەپۆش:** بێمێشک، ناژیر.

**کەللەتەزێن:** بۆ ئاو و ماستاو و چێتیری زۆرسارد بەکاردەبرێ.

**کەللەچلخ:** مرۆڤی سەرزل.

**کەللەرەق:** سەرسەخت، سەرهیشک، ڕق ئەستوور، لاسار، هەرووک.

**کەللەرەقی:** سەرسەختی، سەرهیشکی، ڕق ئەستووری، لاساری.

**کەللەزوور:** مرۆڤی ترسەنۆک.

**کەلەشەق:** مەردومی تووڕە و تڕۆ.

**کەللەشەکر:** کەللەقەند، شەکرێکی داڕژاوە، کەسەرێکی پان و سەرێکیشی باریکە.

**کەللەقەند** (ئەردە.): کەللەشەکر، کەللەقەن.

**کەللەکردن:** سەرەوخواربوون، سەرەوژێربوون.

**کەللەکڵاو:** کەوەی کڵاو، کەمەی کڵاو.

**کەللەکۆن:** مەبەس لە مرۆڤی کۆنەپەرستە.

**کەلله مەحەللەق** (ئەردە.): سەرمەقولات، هەڵە و گەریان.

**کەڵ لێکەفتن** (ئەردە.): کارتێکەوتن، کارپێکەوتن بە کەسێکی.

**کەللەمێ:** دەنگی گەورە و قەبەیە،کە کارلەمێشک بکات خۆش یا ناخۆش، کەلەکی، شێت. (ئەردە.) دالان، ژوورێکی درێژە لەتەنیشت دالانێ. (ئەردە.) باسەر، تووڕە، توند. (ئەردە.) سەرەنداز، سەرەنناز.

کەلێش

**کەلەزاندن** (باک.): کولاندن.

**کەلەزین** (باک.): کولان.

**کەلێش** (باک.): مێشولە.

**کەلنەوەن** (بناری پژ.): ئاوارە، دەربەدەر، بێگانە.

**کەڵوز** (باک.): سەرمای زۆرسەخت.

**کەڵوالەک:** گیایەکی بەهارییە گوڵێکی سووری هەیە وەک پیالەوایە بنکێکی خڕی سپی و شیرینی هەیە.

**کەڵوان:** گزگل.

کەلۆ

**کەلۆ** (سل.، هەورا.): بورج.

**کەلۆت** (مرک.): ئەو گایانەیە، کە لە دەوری مانگا بەکەڵی دەناڵێن. کەلبوون، ددانکەوتن، کەل و کەلۆس بوون.

**کەلۆر** (شا.): خووێری، توێری.

**کەلۆس:** کەسێکە ددانێکی لەپێشەوە کەوتبێ، کەل، کەل و کۆم، کەلۆت.

**کەڵۆک** (باد.): کەڵەکەبەرد.

**کەڵۆک** (باک.): کولۆک بۆ نیسک و نۆک.

**کەڵۆمە** (خۆ.): دیوارێکی باریکە لەدەورەی کونەکەی بەرداشەکەی سەرەوەی ئاش دەکرێ بۆ ئەوەی تادان بچێتە ناوکونەکەوە.

**کەڵومز** (باک.): پاگە، پرژ.

**کەڵومزان:** جێگای سەخت لەچیایاندا.

**کەلوو:** بورجی فەڵەک. پۆلکە. قاووخ و کیفی نۆک و پۆلکە و ئیترە، کەلی پێش ئەوەی ووشکبێ. قوڵفەی تێپەلکێشی ئەو چتانەی، کە بەشیشە دەچنرێن وەکوو گۆرەوی و لفکە و ئیتر. (کۆ.) گلێرە. (باد.) ئیشتیا، هەوەس.

**کەلووەخۆرە:** زیندەوارێکە مێملی فەریکە نۆکییە بەتەڕی دەیخوات.

**کەل و پا:** سەرووپێی ئاژاڵی وورده.

**کەلوپاچکە:** سەرووپێ.

**کەل و پەل:** ووردەواڵە، کێل و پێل، چت و مت، چتومەک، (باک.) کەل و مەل، پرتووک، پرووپیتاڵ، نووێن و جل و بەرگ، کەل و پوور، خرت و پرت، وورده کەل و پەلی ژنان: پروپیت، پرووپیتک، پرووپیتاڵ.

**کەل و پەل و یانەی** (هەورا.): نێومال.

**کەل و پوور** (ئەردە.): کەل و پەل، ناومال.

**کەل و پێل:** کەل و پەل.

**کەڵوور:** کەڵهوڕ، خێڵێکی گەورەیە لە کورد.

**کەڵووڕی:** جوورە گۆرانییێکە بە زاراوەی کەلهوڕان، زاراوەی کەلهوڕان.

**کەلووکۆم:** کەل، کەسێکە ددانی تاقتاقە مابێ. چتی کۆنی شەق و شڕ.

**کەلووز:** فندق، بەری کاژ.

**کەلووک:** نیوەی چارەگە خشتێکییە، پارچەیێک.

**کەلووگرین** (باد.): خەریکی کوڵی گریانێ بوون.

**کەل و مەل:** کەل و پەل، چتەمک.

**کەلهاتن** (ئەردە.): بەکارهاتن.

**کەلهاندن** (باک.): کولاندن، بکەلهێنە.

**کەلهە** (باد.): قەلا، قەلات.

**کەلهور** (باک.): کەلهوڕ.

**کەلهین:** بڕوانە: کەلهاندن.

**کەلی** (باک.): گیایەکە.

**کەلیز** (باک.): کوولەکەی ووشک.

**کەڵێن:** قایشێکە لە ملی تاجی دەکرێت. (کەل.، فە.) گەورە، مەزن، گر.

**کەلێن:** دەرفەت، کولێن، کەلەبەر، گۆشە، جێگای بەلاوە، کوژی تەریک، قوژبن، قەڵەشت، پەناودالدە، کەمین. بۆسە، مەلاس، (جا.) پەیجۆ، مکۆ، ئەر.

**کەلی:** کەلوو، هەر کەلوویەکی دانی تێدابێ ــ پێدەڵێن، تێکولی پاقلە و نۆک و ئیترە. فەریک: ــ نۆک: فەریکەنۆک. (ڕەوا.) داڕنین، وەکو تێکولی لە گوێز و چتی تر کردنەوە. (ڕەوا.) لا، کلا. ــ بوون: لادان، کلابوونی بەرد و تیر. بە ــ هاتن: ترازان. بە ــ هێنان: ترازاندن. (کە.) کەلەبەری نێوانی دوودیواران. ئاستی کەلایی چت. (باک.) بێتام، بێخووێ. (باد.) گیانداری کلک کورت. گیانداری گوێ کورت. (باد.، باک.) کولاو، نەکەلی: نەکولاو. خواردەمەنی کەمخووێ. (شەم.، هەو.) پۆڵکە.

**کەلیان** (باک.): کولان، بکەلە.

**کەلیچە:** پالاخی گامێشییە، کە دروسالاّنەبێ.

**کەلیز** (باک.): دەستەلاّت، توورزوو، شموت. کلێنچکەی مەڕ.

**کەلیشە:** دەردێکی بۆگەنیوە، بۆگەن بوونی نێوقامکی پێ، بنهەنگلیە، کلیشە، بۆکلێشە.

**کەلیلان** (زا.): گەرمی.

**کەلیمە:** ووشە.

**کەلیمەی شادەت:** ووشەی شادەت.

**کەلین** (باک.): کولّین، کولاّن، بۆ ئاو و چێشت.

**کەلّین** (ئەردە.): زەلام، گەورە، زل، کەلاّن.

**کەلینجەک** (باک.): قامکە چکۆلّە.

**کەلینۆک:** گەنمی برژاو، برێشکە.

**کەلیهاتن:** ترازان، سەری چتێکی لە چتێکی تر بترازێ.

**کەم:** ناتوورە، نزم، پەست. کێم، چک، نەخت، سۆک، تۆز، هیچ و پووچ، بڕ، پیچ، برەش، قیچ، بەپێچەوانەی زۆرییە. کەم کردن: کێم کردن، نزم بوون، هاتنەخوارەوە. کەم کردنەوە: (باک.) لکی تازە، کەدی تازە، شەخەڵ. قوتە: ئاژا لێکە گوێی برابێ. ـــ بوون: پەچکان.

**کەما:** گیایەکە، بۆرکەما گیایەکی بەهاری بۆنخۆشە لاسکی ئەستوور و گەلاّی ووردی بەهارییە کارگیش دێنی دەکرێتە گزرە بۆ ئاژالاّن.

کەماچە

**کەماجار:** شووێنێکە، کە کەمای زۆربێ.

**کەمارچ** (باک.): زوور، زبر، ئەستوور، توند، پتەو.

**کەماچە** (زا.): کەمانچە.

**کەمارخ** (باک.): سمت، گۆشتە ئەستوورەکەی دەوری قوونییە، (باد.) کامۆخ.

**کەماسایی:** پێداویستی، دەست کورتی، ئاوسەرکەمی، کەمایەسی.

**کەماسی:** کەماسایی، ئاوسەرکەمی، کەمایەسی، کەم و کووڕی، ناتەواوی، دەست کورتی، کێماسی.

**کەمالّەڵەیی:** تیرەیەکە لە جاف.

**کەمان** (هەورا.): ڤیۆلۆن، کەمانچە، سینەکەمان، کەوان.

**کەمانە** (هەورا.): کەوانە، مرازێکی ئاهەنگییە، تیرێکی ئاوێژراوە، کە بگەڕێتەوە بە هۆی ئەوەوە، کە وەچتێک کەوتبێ.

**کەمانچەکەوانە:** پارچەیێکە لە پارچەکانی مۆزیقە، چەند ژێیەکی پێوەیە دارێکی تایبەتی لە ژێیەکان دەدرێ دەنگێکی خۆشی لێوەدێ.

**کەمانچەژەن:** کەوانەژەن، کەسێکە، کە کەمانچە لێبدا. ـــ ی: کەوانەژەنی.

**کەمانچەژەنین:** کەوانەلێدان.

**کەماندار:** کەواندار. ـــ ی: کەوانداری.

**کەماندن** (باک.): سووتاندن بە کەمەناورێکی، فەوتاندن.

**کەمانکێش:** پەتکەر. ـــ ی: پەتکردن.

**کەمەلو:** بێ ئاو، چێشتی پەیتە.

**کەماهی** (باک.): کەمی.

**کەمایەتی:** کەمێتی، کەمایەسی، کەماسی، کەم و کووڕی، ناتەواوی، دەستکورتی، کێماتی، کێماهی، کێماسی، چتێکی کەمە لە نێو چتێکی زۆردا.

**کەمایەسی:** ئاوسەرکەمی، کەمایەتی، کەم بوونەوەی چت و نزیک بوونەوەی لەبڕانەوە.

**کەمایی:** کەمایەسی.

**کەمە** (بابا.): پەڕەی خەرەک. (جا.) ناوقەدی شاخان. (ڕۆژ.، کە.، بابا.) کەوە، کەڵلەبێژنگ و هێلّەک و ئیتر. چەمە، چەمیاگی، چەمەیی گۆچان. تەختەی کەوانەداری ئەم سەرو ئەوسەری لاتک.

**کەمەچ:** نیشانە.

**کەمەچکردن:** نیشانەکردنی مەڕ بە هەڵپاچینی کەمێک خوری پشتی.

**کەمەر:** نێوقەد، ناوقەد، کەمبەر. بەرقەدی کێوان. (ڕۆژ.) خەرپوشتە، سەربانێکە بەبێ دارەڕابەخڕی وەکو گومبەزی دەگەیەنرێتەوە یەکتری. (فە.) کێو، (هەورا.) بەردی زل و زەلام، شاخ. (هەورا.) ماه، چیای بەرد. پشت. گیایەکی هاوینییە. (زەن.) بەرد، خڕکەبەرد. کەمەرناسنین (زەن.): ئەو بەردە ڕەق و شۆڕاو و سواوانەیە، کە لەناو خڕوچۆم و ئاواندایە، (زەن.) قاچ، (هەورا.) سیرەکۆڵێ.

**کەمەرە:** لاوانەیەکە، لەناو قەدی منارەدا بانگی لەسەردەدەن. ناوقەدی شاخ. چەند تەختەیەکە لەڕووکاری دۆلّیانی ئاشی دەدرێت، نێوەڕاستی زەوی. کەمبەرە٣ قوبەی هەیە وەکوو کەڵەوە پان دروست دەکرێت، پشتێندێکی زێوین یا زێڕینی گوڵدارە ژنان لەپشتی دەبەستن. (فە.) پشتێندی پردێ. نووسراوێکە لەسەر خشتی سوورکراوەوە.

**کەمەرەشل** (مرک.): جوورە گۆرانییێکە.

**کەمەرباریک:** ناوقەد باریک.

**کەمەربەس:** پشتێند.

**کەمەربەسە:** کەمەربەستە، نۆکەر. ئامادە.

**کەمەربەست:** پشتێند، کەمەربەستە.

**کەمەربەستە:** ئامادەی ئەنجامدانی فەرمان.

**کەمەربەستن:** پشتێندبەستن، ئامادەبوون بۆ ڕازەی یەکێکی.

**کەمەربەن:** پشتێند، کەمەربەند، پژوێن.

**کەمەربەند:** جوورە خشڵێکی ژنانە دوو شەپکەی زێڕین یا زێوینی نەخشاوە قوبەیێکی گەورەی لەنێوەڕاستیدایە. جوورە پشتێندێکی دوو تووێییە دراوی تێدەکرێ. جێگای پشتێند.

**کەمەرچین** (باک.): چارشێو، عابا، پەردە. جوورە پاڵتۆیەکی ژنانەیە، کە بەسوورمەدا دروابێ.

**کەمەردووخ** (ئەردە.): بەرەتەشی، لاسکی تەشی.

**کەمەرک** (باد.): کەمەرە، کەمبەرە.

**کەمەرکەش** (ئەردە.): دەرپێیەکی کورتە لەژێر شەڵوارەوە لەپێدەکرێ.

**کەمەری پردێ:** پشتێندەی پردێ.

**کەمەری کێوی:** ناوقەدی کێوی.

کەمەرکەش

**کەمەک:** کەمێک، نەختێک، تۆزلاّنە.

**کەمەن:** کەمەند، تەناف، قەتار. گوریسێکە ئەوانەی تۆیەکارن لەنەژنۆی خۆیانی دەپێچن و خەریکی دڵ و خودای دەبن.

**کەمەند:** چتێکە وەکو حەگاڵ لەکاتی دانیشتنیدا دەکرێتە پشت و بەر ئەژنۆو تا بەملاولادانەکەوێ. ئەو گوریسەیە، کە دەخرێتە ملی وولاخی ڕەمۆز و یاخی. گوریس یا زنجیرێکی درێژە ئەمسەرە و سەرەکەی بە سینگێکەوە دەبەسترێتەوە وولاخی بەرێزە پێوەدەبەسترێتەوە. تەنافێک بووە پاڵەوانان لەکاتی شەڕیدا بەکاریان دەبرد.

**کەمەندکێش:** بریتیە لەکەسێک، کە گیرۆدە و گرفتاری ڕەوشت و خووی بەرزی پیاوێکی خوداناس بووبێ.

**کەمەند هاویژتن:** هاویژتنی کەمەند بۆ گرتنی چتێک.

**کەمەوکردن:** کەم کردنەوە.

**کەمەی دانرە:** کەوەی خڕ، زێواره، لێوار.

**کەمبلخ** (هەکا.، شکا.): وێران، کاوول، کەلاوە. (زا.) زۆردار، ستەمکار.

**کەمبارە** (ئەردە.): کەم بەهرە، کەم سوود.

**کەمبار:** بڕوانە: کەمبارە.

**کەمباز** (ڕەوا.، هەو.): بڵندایی، کۆسپە، جێگایەکە ناودڕیێتی و بەسەریدا باز بدرێ.

**کەمبەت** (زا.): گومبەز.

**کەمبەر** (باد.): پشتێند، کەمبەربەست. کەمەر.

**کەمبەرە:** کەمەرە.

**کەمبەربەس:** پشتێند.

**کەمبەربەست** (باد.): جوورە زۆرانێیەکە دوو کەس دەچنە ناوکەمەندێکی تا یەکێک یەکێکی نەکوژێ ناتە دەرێ. جوورە پشتێندێکیشە.

**کەمبەربەستی:** بە شێوازەوە ڕاوەستان، دەست لەسەر پشتێند دانان.

**کەمبەربەسی:** کەمەربەست.

**کەمبەرۆک** (باک.): گیایەکە.

**کەمبەڵ:** بەرزایی سەرلێوانە، مەم دەڵێ: بریا ئەو جامە بام ئەگەرپای زین بە پەنجەی مویارەکی دەی ئاوێژتمە سەر کەمبەڵی دەلێوان.

**کەمبوون:** هندک بوون، نزیکبوونی چت لە بەسەر چوونی و برانی.

**کەمبوونەوە:** کێم بوونەوە، کەم و کووڕی لێپەیدابوونی چت.

**کەمتابێژ:** کەمێک لە چتێک یا لەکاتێک. ـ ێک ڕۆنیشت یا خواردی یا ناخۆت.

**کەمتار** (فە.، هەورا.، لو.): کەمتیار، کەفتار.

**کەمتەرخەم:** وولحێ، بێ سەروبەر، (باد.) چنال، شلیخە، کەسێکە چتی زۆر مەبەست نەبێ، بێ موبالات.

**کەمتەرخەمی:** بێ سەروبەری، گووێ نەدانەچت.

**کەمتر:** کێمتر، کەمینی. ـ ین: کێمترین.

**کەمتیار:** (هەورا.) کەمتار، کەفتار، خەفتیار، هەفتیار، ئەفتار، داعبایەکی کێوییە یاڵ و سمی لەهی کەرەچێ، گۆڕهەڵکەنە.

**کەمتین:** بێ تین، لاواز، بێهێز. ـ ی: بێ تینی، لاوازی.

**کەمچە:** ئاسنێکی درێژە دەسکەکەی دارە ئاگری توونی پێدەکرێ. ماڵە، توونشێو، کۆلـو وەژ، ئاگری تەندووری پێ تێکوەردەدرێ. ماڵەی بەنناییە. (ئەردە.) کەوچک.

**کەمچک** (لو.): کەوچک.

**کەمچیکڵدانە:** توورە، قەڵس.

**کەمخە:** تەنراوێکە، کە لەتاوریشمی سووری ڕەشباو دروست کرابێ.

**کەمخەو:** بێخەو. ـ ی: بێخەوی.

**کەمخۆر:** دژخۆر، (هەورا.) کەموەر، کەسێکە خواردنی کەم بێ. ـ ی: دژخۆری، (هەورا.) کەموەری. کەمخێر: بێ سوود، بێبارە. ـ ی: بێسوودی، بێبارەیی.

**کەمدەس:** کەمدەست.

**کەمدەست:** کەمدەس، دەستکورت، هەژار، ناوسەرکەم. ـ ی: ناوسەرکەمی، کەمدەستی.

**کەمدەسی:** دەستکورت.

**کەمدڵ:** بێدڵ، بێجیگەر، ترسەنۆک. ـ ی: بێدڵی، بێجیگەری، ترسەنۆکی.

**کەمدوو** (هەورا.): شەرمێوون، دژدوو، کەسێکە کەم بدوێ. ـ یی (هەورا.): شەرمێوونی، دژدوویی.

**کەمدووێن:** دژدووێن. ـ: دژدوویی.

**کەمر** (هەورا.): بڕوانە: کەمەر. (ڕۆژ.) بەرد، گاشە.

**کەمرانەن** (باک.): گۆشت سوورکردنەوە.

**کەمرووێژ:** کەمتابێژ.

**کەمرە** (خۆ.): ئەو تووێ توند و پەیتەیە، کە لەسەر شلەمەنی دەمەیێ. (وا.) کەرمە، گەوور، کەمڕە، (کۆ.، هەورا.) گەمرە، سرە، سر، پەین و شیاکەی بەسەریەکدا پەستراوە ووشک بووتەوە لەتەویلەدا تەختەتەختە هەڵدەکەنرێ. بەکانگەی ڕشک و ئەسپێیانیش دەڵێن لەسەروبەرگی هەژاراندا.

**کەمڕەووت:** سستڕۆ.

**کەمڕوو:** شەرمێوون، بەشەرم، شەرمن. ـ یی: بەشەرمی، شەرمێوونی، شەرمن.

**کەمرین** (باک.): گۆشت سوورکرانەوە.

**کەمشیر:** ئەبرەش، عەبرەش، گیان لەبەری کەمشیر.

**کەمفرۆش:** کەسێکە چتی کەم بفرۆشێ یا بەکەمی بفرۆشێ. ـ ی: کەمفرۆشتن، بەکەمی چت فرۆشتن.

**کەمقنیات:** کەمخۆر.

**کەمک:** بەردێکی زۆر زلە لەسەر یا لەبەرقەدی چیایاندا یا خلۆربووبێتەوە خوواربێ. قیتکایی سەری چیایان، کەپک. (باک.) دەسرە، دەستەسر.

**کەمکەم:** تۆزەتۆزە، نەختەنەختە.

**کەمکەمە:** تۆزتۆزە، نەختەنەختە، پچک پچک، بەرەبەرە، لەسەرەخۆ، پیچ پیچە، برەبرە.

**کەمکردن:** هندک کرن، کورت هێنانی چت، نزم بوون، هاتنە خووارەوە، پەچکاندن، لاوازبوون.

**کەمکریاگ:** کەمکراوەوە. گوێزێکە بە تێکوڵی سەوزەوە.

**کەمکۆڵ** (هەورا.): تێکوڵشینەکەی گووێزیە، کاکڵەگووێز، گووێزی تەڕوتاڵ، کەرکۆڵ.

**کەمکوڵی** (ئەردە.): سووری تاریک، قاوەیی.

**کەموارەدەی** (هەورا.): کەمخواردن، لەخواردن دابڕان.

**کەمۆ** (کۆ.): دەستەمۆ، ڕام، هۆگر. (گەر.، زرا.) بلیمەت، زۆرزان، بەرگە، (زرا.) پیتۆڵ، ڕامیار.

**کەمۆت** (زا.): بێ گوێی لاسار.

**کەمۆچک** (باک.): پێکەوە.

**کەموەر** (هەورا.): کەمخۆر، دژخۆر. ــ ی (هەورا.): کەمخۆری، دژخۆری.

**کەمووتەر** (لو.، فە.): کۆتر.

**کەمووتر** (فە.): کۆتر.

**کەمووسکە**: زۆرکەم لە چتێک.

**کەم و کووڕ**: چتی کەمی نیوەچڵ.

**کەم و کورتی**: کەم و کووڕی، ئاوسەرکەمی پێداویستی.

**کەم و کووڕی**: کەم و کورتی، بریتییە لە دەستکورتی و هەژاری.

**کەمۆڵە**: کاسەی دزی گەورەی دارین.

**کەم و نات** (شەدەڵە): کەم و کورتی، کەم و کووڕی.

**کەم وونی** (هەورا.): کەمخوێنی.

کەم وینی (هەورا.): کەم دیتن.

**کەمێ**: کەمێک، بڕێک، پیچێک، قیچەکۆک، نەختێ، تۆزێ، چەپێ، چکێ، خەمێ، هێندێک، نەختێک.

**کەمێتی**: کەمی، کەمایەتی، کێمایی.

**کەمێک**: چکێ، قیچێک، قیچەکۆک، بڕێک، پچک، نەختێک، کەمێ، پیچێک، پچکۆک، تۆزێک، هندک.

**کەمێل**: چڵک و قرتاغەی چڵک و ئەسپێیانە، بەوتڵ و ڕیخەش دەڵێن، کەبەپاشڵی مەڕان و ماڵاتانەوە دەنووسێ ووشک دەبێتەوە، کەمێڵە، گنجی، (خۆ.، ڕەوا.) بەرمیز.

**کەمێڵە**: بارستایی چڵکی لەشی مرۆیان و خوری ئاژاڵان، کە پشکەڵی پێوە ووشک بوویێتەوە.

**کەمی** (هەورا.): کێمی، کەماسی، کەمایەسی، کەماهی، کورتی، بەپێچەوانەی زۆری. نزمی، پەستی، هیچ و پووچی، ناتەواوەیی.

**کەمیک** (باد.): دەسرە، دەستەسڕ.

**کەمیەتی**: کەمێتی.

**کەمین**: سیپە، مەکۆ، (جا.، کە.) پەیجۆر، کەلێن، بۆسە، مەلاس، هەف، حەشار، حەشارگە، کەمینگا، نێچیرگا. کەمتر، بچووک. (باک.) لەناوچوون، سووتان بەکەمە ئاورێکی. پەنهان بوون.

**کەمینگا**: شوێنی خۆتێدا حەشاردان، پەناگا.

**کەمینگە**: بڕوانە: کەمینگا.

**کەن** (کە.، ئەردە.): کەند، کەندەلآن، کەناو. (زا.) پێکەنین.

**کەنار**: مۆرد. قەراغ، (هەورا.) کەراغ، لێوار، چالاڤ، کەڤ، کەڤی، قەیار، گەرانۆک، (باک.) کار، پیێغ، ڕەغ، ئالی، دەم، گووێ. ــ او: دەم ئاو، گووێ ئاو، کەنارگە، پەرگە، کەنک، لەوچک، هێل، سوو، ڕۆغ، رووخ، قەراغ، سیلە، بەر، تەنگاڵ، (باک.) زجێف، فاج، کەنار، (ئەردە.) زیوار، کلا.

**کەنارێو**: قەراغ ئاو، دەماوەل. ئاودەستخانە.

**کەنارە**: باڵندەیێکە. پەراوێز. کەنارە لاکێشی درێژوبارێک، کە لەملاولای فەرشی نیوەڕاستەوە ڕادەخرێ.

**کەنارەگرتن**: لادان، گۆشەگیری، خۆدوورخستنەوە لەکارێک.

**کەنارەگیر**: گۆشەگیر، گۆشەنشین، چۆڵەبڕ، لاشەر، جوڵەچوون. ــ ی: گۆشەگیری.

**کەنارەی ئاسمان**: دیارگا، دیارگای چاو.

**کەنارخستن**: خستنەلاوە، کەناردان.

**کەنارەدەریا**: لێچ دەریا، لێواری زرێ.

**کەناری** (باد.): دەرکەزی.

**کەناڵ**: کەندەلآن.

**کەناندن**: پێکەناندن.

**کەناو**: دادرگەی ئاو، ئاودرگە، کەن، کەند.

**کەنای** (هەورا.): هەڵکەندن.

**کەنە**: کنە.

**کەنەسمە** (ئەردە.): کەندەسمە، هەنگەوچنە.

**کەنەف** (کە.): کەنەفت، زەبوون، بێدەستەڵات.

**کەنەفت**: (باک.) بڕەش، کەوتوو، کەلاک، ڕزیو، زەبوون، پەرێشان، ڕووت، (کە.) کەنەڤ، چەپەرەک، چەپڵەک، چرووک، نەزۆ. ــ بوون: داوەشان، زەبوون بوون. ــ کردن: (کە.) دەڵەکردن، زەبوونکردن. لەبەرچاوکەوتوو، تخڵ، نەگەویس، نەکەویس. ــ بوون: نەگریس بوون. ــ کردن: نەگریس کردن. ــ ی: کەساسی، زەبوونی، پەرێشانی.

**کەنەک** (گەرمێن): بەردوکوچک. (موک.) زوورگ، کەندوکۆسپە، کەن و کۆسپە، زەوی بڵند و نەوی، گابەرد.

**کەنەکار**: مۆرکەن، مۆرهەڵکەن. ــ ی: مۆرهەڵکەندن.

**کەننەلآن** (کە.): کەندەلآن.

**کەننەنە**: تەشوێیەکی گچکەی دەم کەوانەییە ناوی کەوچک و نەسکۆی پێهەڵدەکەنرێ دووایە بە لێسک لووسدەکرێ.

**کەند**: (هەورا.) دەستە. ئاووڕ، ئاقدرگە، سیو، خڕ، چق، کۆرتاڵ، کەنداڵ، کەندەلآن، (کە.) کەن.

**کەنداڵ**: قووڵکە، چاڵ، قۆرت، کەند، کەناڵ، کەن، دیرگە، کەندەلآن، کەنەلآن، زەوی و جێگایانی بڵندە لە قەراغ ئاوان، تەپۆڵکە. (باد.) گێژ.

**کەندو**: شوێنێکە لە قەراغ دەریا، کەناو دایدڕیبێ و ماوەیەک چووبێتە ناوەوە، کەننار.

**کەندەسمە**: (کە.) گەنەسمە، (ڕۆژ.) خەنجەربالا، (ڕەوا.) ڕەنگە ڕژە، (خۆ.) گرگاڵە، ڕەنگاڵە، (باد.، دەر.) قاشقاژە، ڕەنگارە، باڵندەیێکە لە پەشۆڵە گەورەترە هەرلەناوقەدی کەنداڵان هێلانەی دەکات.

**کەندەک**: خەندەک، چاڵ و قۆرت.

**کەندەکار**: کەسێکە کاری هەر هەڵکەندن بێ.

**کەندەلآن**: کەنەلآن، کەند، قەد پاڵێکە ئاو دایدڕیبێ وەکو دیوار ڕاست ڕاوەستابێ.

**کەنڕ:** کندڕ، کز، بوودڕێکە لەزەوی، کە ئاودای دڕیبێ.

**کەندر** (کە.): شریت، کندر، کز. دەزوو، تیرە.

**کەنن:** هەڵکەندن. تڕ یا فس کەندن.

**کەنۆ** (باڵەک.): پارگوویر. (شەق.، ڕەوا.) کۆندۆ، مانگای ئەستیوور و قسرە، کە هێشتا ووشکی نەکردبێ.

**کەندوو:** (بڵ.) نووسرە، کووار، کووارە، کەنۆکە، (کە.) کەنوو، چتێکی بۆشی بەرزی گەورەی پێچکدارە وەکو ژوورێکی چکۆڵە لە قوڕ دروست دەکرێ بۆ دەغڵ و دان تێکردن. کەندووی مێشهەنگووینی: خلێف، گۆرز، دوویەرەی هەنگووین.

**کەنیر:** گوریس.

**کەنیل** (باک.): گوریس.

**کەنەوە:** ئاژاڵێکە، کەقەڵەوبووبێ.

**کەنس** (ئەردە.): ڕژد و چرووک. ـــ ی: ڕژدی، چرووکی.

**کەنشت** (هەورا.): گیان. ـــ دان: گیاندان.

**کەنشت:** تووزم، خوو.

**کەنشتە:** کنیشتە، پەرستنگای جوولەکانە.

**کەنف** (باک.): ئاودەست، ئەدەبخانە.

**کەنک** (باک.): پیست و تووێژی تەنکە لە نێو خوری ئاژاڵاندادەبێ.

**کەنکەنە** (باک.): گەورەی گەوران.

**کەنگ** (بابا.): کەندەڵان.

**کەنگەڵان** (بابا.): کەندەڵان.

**کەنگر:** کنگر، قنگر، (باد.) کەرەنک، (باک.) ئەرتیچۆک، ئەنگینار، ژەهر (جەوی) یەکەی لە نێو ئاوێدا گەرم بکرێ لە خورێنی بخورێ بۆ زەرداویێ زۆرباشە. ـــ دوو جوورە: ڕەش و زەرد، هی زەرد تەنها لە نێو چیایان و کوێستانانداهەیە.

**کەنگرە خاتوونە:** جوورە کەنگرێکی درێژ و ناسکە لە دێمکاراندا دەست دەکەوێ.

**کەنگرەماسی** (ڕەوا.): جوورە چێشتێکە بەو جوورە لێدەنرێ: چەند کەنگرێکی شلک و ئەستووری پاککراو و کوڵاو دێنن چەند هێلکەیەکی بە سپێنەوە تێک وەردەدەن و کەنگرەکانی تێهەڵدەکێشن و دوواییە لەناو ڕۆنیدا سووردەکەنەوە و تامی گۆشت ماسی دەدات.

**کەنگێ:** (بابا.) کەی، (هەو.) کەینێ، (کۆ.) کەنگین، کەنگینێ. لە ـــ وە: لەکەیەوە.

**کەنگین:** کەی.

**کەنگینێ:** کەی، کەینێ.

**کەنن** (کە.): پێست داڕنین، ترکەندن. (ئەردە.) هەڵکێشان. داکەندن (بۆ جل و بەرگ). پێکەنین، چنینی بەری میوەوەشینایی. (ئەردە.) هەڵکەندن.

**کەننە:** ڕنینەوە. چنینی میوە لەداران. خەندەک، کەنەک، خەنەق.

**کەننەڵان:** کەندەڵان، کەن.

**کەننەوە:** کەندنەوە.

**کەنۆ:** داواکار، کومکافر، دادخواز، کەندۆ، گوێرەکەی یەکساڵە.

**کەنۆش** (ئەردە.): کون دووش.

**کەنۆک** (باک.): بەپێکەنینەوە.

**کەنۆڵە** (هەورا.): کەندوو.

**کەنوو** (هەورا.): کەندوو. پێکەنین. کەندووی شانەی هەنگوینی.

**کەنوورە** (ئەردە.): سفرەی چەرمی.

**کەنووش** (خۆ.): کەپۆی کورت، کەپۆکورت.

**کەنوشتاوەوە:** کەوانەی [ ] گۆشەدار.

**کەنووکۆسپە:** کەندوکۆسپە، کەندوکڵۆ، زەوی بەرز و نزم، هەڵەت.

**کەنووی چێوین:** بەرمیل، بۆشکە.

کەنووی چێوین

**کەنێر:** دارێکی کوێستانییە گەڵای وەک داری کەووت وایە، کە بسووتێ بۆنی خۆشە.

**کەنێرە:** گیایەکی بەهارییە گوڵی زەردی گەڵاخڕە و بۆنی خۆشە.

**کەنی:** کچ. ژنێ، لەکاتی ناخۆتنێدا لەگەڵ ژن بەکاردەبرێت.

**کەنیز** (لو.): کەنیزەک.

**کەنیزەک:** کەنیز، کارەکەر، کڵفەت، قەرەواش، (فە.) کەنیش.

**کەنیش:** کەنیزەک.

**کەنیشت** (هەو.): مرازێکی دارتاشییە جێگای شووشەی پەنجەرەی پێ قووڵ دەکەن.

**کەنیشتە:** پەرستگای جوولەکانە، کەنیسەی جوولەکان.

**کەنیشک** (جا.، هەمە.): کەنیلە، کچ، کیژ، دۆت، دوویت. ئەوەی مێیینەی باوک و دایکە. (هەورا.) بەبەلەی چاو، (کۆ.) بیبیلەی چاو.

**کەنیشکاوکەنیشک:** کچاوکچ، دۆتاودۆت، ژناوژن، ژن بەژنە.

**کەنیشکەزاگ** (ئەردە.): کچەزا، نەوە.

**کەنیشکی:** کچێنی، کچێنەی چاو، گلێنە.

**کەنیشکی:** کچێتی.کچێنی، بن.

**کەنیلە** (ئەردە.): کیژێ، کچێ.

**کەنین** (باک.): ترەقین، ترەقیان، پێکەنین، خەنین، زەقین. (کە.) تڕین، فس کەندن.

**کەو:** (هەورا.) ژەرەژ، (باک.) قتک، بەق، چیل، پەرەوورێکی کێوییە کەویش دەکرێ، ڕەنگی قورقوشمییە پێ و دندووک و چاوی سوورە. کەوی بۆر: چێلکەو، چیرکەو. کەوی بۆغە: کەوێکە بخووێنێ. کەوی مێ: چێل، مێکەو. کەوی چیر: کەوی بۆر. کەوی کەنگەر: کەوێکە لاڵ بێ و نەخووێنێ. کەوی نێر: (هەورا.) بەق، باڵندەییێکی خاڵ و میل داری لاق و دندووک سووری بۆرە لەکۆتری گەورەترە. (فە.) ڕەنگی شین. هەڵکوشینی برینە بۆ پاک بوونەوەی. قەربیل، گڵ گیر، سەرەند، سەرەن، چتێکە وەکو بێژنگی، بەڵان کونی گەورەترە لە گڵگیر شاشترە خەرمانی پێ پوختەدەکرێ. گیراوەوەی خووێ و زەردێنەی هێلکەیە یا خووێ و هەنگووینە بە کوڵاوی برینی پێ دەبرژێننەوە. ـــ ئێخستن: برژاندنەوە.

**کەوا:** (باک.) ئەنتاری، خەفتان، (دەر.) قەوێ، کورتەک، کولەچە، کەوێ. (بەخ.) سێچاک. ـــ ی درێژی ژنان: سایە، کەوێ، کولەچە بۆ ژنانە: کولۆجە.

**کەوابوو:** کەواتە.

**کەواتە:** کەوایە، کەوابوو، خەریکم بچمەوە مەهاباتێ، کە وایە پێ لە منداڵەکانم مەبڕە.

**کەوار** (باک.): کووار. گۆزە، کووپە، خەڵی مێش هەنگوینێیە، ژووری دانەوێڵەیە، ئەنبار.

**کەواز:** بە هەموو چتێکی دەڵێن، کە لە گڵ دروستکرابێ.

**کەواشە** (باک.): هەڵاشێکە دەخرێتە سەرداری دارەڕایە.

**کەوارغ** (باک.): گۆزەگەر.

**کەوال** (زاخ.): گاڕان، مێگەل.

**کەوان** (هەو.): مرازێکە لە کەرەستەی چێکەنە. کەمان، شیو، خەمان، کەمانە.

**کەوانە:** بازە، سینە، هەڵقۆزرانەوەی کوللە و داروبەردە، کەوەجێگایەکی بکەوێ و دووبارە بەرزبێتەوە. (باد.) کڤان، (تیروکڤان)، کەڤان، کەڤانە، (باک.) قاب، دارێکی چەماوەوەیە تیری پێدەهاوێژرێ. پیچ و دەرەی سەربەرەوژوورە، هەموو چتێکی کەوانەیی، لای ژوورووی هەمووچت. (جا.، سزێر.) لای سەرەوەی مێگەلییە، لای ژوورو و سەرەوەی چیاو داروێنترە. پێڵاوی دارینە لەسەر پێڵاوی تر لەپێ دەکرێ بۆ ئەوەی بەسەربەفری دابڕۆن و نەچەقێن. کەوان، دارێکی دوولکە بە گوریسێکی باریک دەبەسترێ بەهەردووک پێچکەی شەغرەوە تاقرچە (قرشە) ی پێ بگوێزرێتەوە بۆ سەرخەرمان. کەمانە، کەمانچە، مرازێکی مۆسیقییە. مرازێکی دارتاشییە چتی پێ کوندەکرێت، دارێکی کەوانەدارە چەرمێکی درێژی بەسەرەوەیە لە (مەتە) دە ئاڵێنرێ و داری پێ کوندەکرێت. کەمانەی پەڕەکردنی کارگەچیانە، دارێکی درێژی کەمێک خووارە ژێیەکی پێوەیە پەڕەکەر بە کوتکی هەللاجی لێی دەدات لەکاتی پەڕەکردنێدا. (موک.) لالووسەکەی جگییە. ( ( ) ) [ ] نیشانەییێکی وا لە گردی ووشە یا ژمارەییێکی گرنگ دەنووسرێ.

**کەوانەدار:** گەردار، چتی کەوانەیی.

**کەوانەژەن:** کەمانچە ژەن.

**کەوانەکردن:** کەوەکردن. دووبارە بەرز بوونەوەی چتێکە، کە وە زەوی و ئیتر کەوتبێ.

کەوانەژەن

**کەوانەی چەرخ:** کەوەی چەرخ.

**کەوانەی گۆشەدار:** کەنوشتاوە، کەنوشتاوەوە ئەمە [ ].

**کەوانەیی:** چتێکە بەرێکی چەمابێتەوە.

**کەوان پیتک** (ئەردە.): دارەلاستیکە بەردی پێ دەهاوێژرێت.

**کەواندن** (باد.، باک.): برژاندنەوەی برینان. (فە.) خستن، ئێخستن، کوورکردنەوە، (هەورا.) گلێرنای.

**کەوانگۆشە:** نیشانەییێکە وەکو: [ ] کە ئەمیش وەکو کەوان بەکار دێنرێ.

**کەوانی چەرخ:** کۆلکەزێڕینە.

**کەوانی ڕۆستەم** (کرما.): کۆلکەزێڕینە.

**کەواو** (کە.): دۆیەکە تاوی زۆر تێکرابێ. (هەورا.) بەردێکی قووڵە تاوی بارانەی تێدا ڕاوەستی، تەو، هەرکەو. کەباب.

**کەواوچی:** کەبابچی.

**کەواوخانە:** کەبابخانە.

**کەوایە:** کەواتە.

**کەوایی** (کە.): شین.

**کەوە** (کە.، بەر.): ڕەنگی شین، (ئەردە.، هەورا.) کەوورگ. ئەو تەختە تەنکانەیە، کە خڕ داهێنراونەوە بۆ هێڵەگ و بێژنگ و دەفە و ئیتر. کەوەی دەغڵ پێوانێ. کۆچەڵ. جەغزی خڕوگێڕ.

**کەوەت:** دارکەوت.

**کەوەر** (کە.): سووانەی شاخێکی تراشی وایە کەمێک سەری بە لایەکیدا هاتبێتە پێشەوە. کەوورگ، کار، زاخ، پەناو ئەشکەوتێکە لەچیایاندا، کە گیان لەبەر خۆی تێدا لە بارانە و با بپارێزی. گیایەکی دەستچێنە وەکو کوڕادە وایە تاوی پێنج شەش دەسک کەوەر لەگەڵ کەمێک تازۆت و موقلی ووردکراو بگیرێتەوە و پێکەوە بکوڵێنرێن، کە ووشک بۆوە بکرێتە حەب ڕۆژی ٣ دانە بۆ ڕەوانی و مایەسیری و هەرس زۆرباشە. (فە.) کەوا.

**کەوەرە:** تەوەرە.

**کەوەرگ** (ئەردە.): کەوەر.

**کەوەڕۆژ:** ڕۆژێکە تەنکە هەورێک بەری ئاسمانی پۆشی بێ و سەرمابێ.

**کەوەڕێ** (هەو.): وەڕەز، جاڕس، بێزار، لەخۆبێزار، هەراسان. ـــ بوون: بێزار و جاڕس بوون. (کە.) ناهومێد.

**کەوەڕی بوون** (هەو.): وەڕەزبوون.

**کەوەسێر:** مەڕێکە تووکی دەم و چاوی سپییێکی شین باو بێ.

**کەوەشەن:** سنوور.

**کەوەک:** قووڵکەیەکی گچکەیە تاوی بارانەی تێدا کۆ بووبێتەوە.

**کەوەگی:** گەنەی مەڕوبزنانە.

**کەوەل:** جوورێکە لەبەری دارەمازوو گەڵای پان و تووکنە.

**کەوەلە:** شینکە برینێکە لە قامک دێت وەکو موو بە ئازارە. گیاندارێکی وورده وەک ڕشک لە ئاژاڵان دەدا، قرنوو. چتی شینکار، زەوییەکە شینکار وەکو ڕەنگی چیمەنتۆی وایە بەکاری کشت و کاڵ نایەت.

**کەوەلۆ** (هەورا.): گیایەکی ڕەنگ تەڵخە، بروانە (لۆ).

**کەوەمار:** شینی گایانگێو، شینەمار.

**کەوەیی** (کە.): ئەسپێی بزنییە، ئەسپێی مریشکان، قرنوویەکی شینکارە.

**کەوەیی:** دائرەیی.

**کەوبار:** بێچووەکەو، بارەکەو.

**کەوباز** (موک.): ڕاوکەری کەوان، کەسێکە حەزلە ڕاگرتنی کەوان بکات. ـــ ی: ڕاوکردنی کەوان.

**کەوبەدار:** بەهارێکی درەنگە، کە کەولەسەرداران هەڵدەنیشن.

**کەوبەردار:** بڕوانە: کەو بەردار.

**کەوبووار:** کاتێکە، کە پۆلە کەو چین چین بەرەو کوێستان دەگەڕێنەوە. شوێنێکە، کەکەوی پێدابڕوات.

**کەوتاندن** (باک.): قەڵەمشاندن (بۆ وولاخ).

**کەوت:** بڕوانە کەوێت.

**کەوتەکەوت:** وەڕەوەڕ، حەپەحەپی سەگی.

**کەوتەی** (هەورا.): کەوتن.

**کەوتەی باڵدارا** (هەورا.): گرانەتای باڵندان.

**کەوتن:** هەڵدێران، دەکەوری کەوتن، کەفتن، گلێرای، (هەورا.) کەوتەی، ئەرەوروستەی، کەفتەی. بەربوونەوە، بەلاداهاتن، گلان، تەکەربوون، کووڕبوونەوە، ڕمان، کەتن. بەلادا ـــ : بەلاداهاتن. وەبەر ـــ : پێکان، ئەنگێوران. لێکەوتن: لەفەرمانی میری دەرکران. وێکەوتن، پێکەوتن. تەلاق ـــ. پالکەوتن.

**کەوتنەخۆ:** وەخۆکەوتن، خۆئامادەکردن.

**کەوتنەخووار:** کەوتنی چتێکە لە بەرزییەکەوە بۆ نزمی، (باک.، نەه.) وەرسیان، گرێ (گرێل) بوونەوە.

**کەوتنە سەر:** لێکەتن.

**کەوتنەوە:** دوواکەوتنی کەسێک و لە ڕۆیین، مانەوەی، نیازم بوو بچمەوە مەهاباد، کەچی کەوتمەوە واتە نەچووم و پەکم کەوت. وازهێنان، دووبارە تووشی گرانەتابوونەوە، دووای تارەقەکردنی. دووبارە کەوتن. سەر لە نوێ نەخۆشکەوتن. مانەوە لە لە هاوڕێیان لە کۆچ و کۆچبارێدا.

**کەوتوو:** بێچارە، کەنەفت، کەفتوو، کەتی. ڕاکشاو، درێژبوو. ڕماو، تەپیو، کەسێکە یا چتێکە کەوتبێ.

**کەوتوویی:** گرانەتا، گرانەتێ.

**کەوتین** (باک.): قەڵشین، قەڵەشران (بۆ وولاخ).

**کەوجز** (ئەردە.): کەوجێز.

**کەوجێز** (ئەردە.): ئاوگەردان، ئەسکووێ.

**کەوچ** (هەورا.): پووحت، باتمان، (موک.) کیلە، کۆتکی دەخڵ پیوانێیە.

**کەوچە** (ئەردە.): کەوچک.

**کەوچەر** (کە.): دەمخووار، زۆربڵێ، زۆروێژ.

**کەوچک:** کەوچە، (هەورا.) چەمچە، کەفچک، کەفچی، چەفچە، (هەورا.) چمچە. ـــ ی دار: چووچک.

**کەوچکتاش:** کەسێکە کەوچکی لە داری دروست بکات، لێسکە، ناوی دێیەکیشە لە شارەزوور.

**کەوچکە:** کەوچکێکە لە چەرەخۆرە دەبەستریَ دانەوێڵەی پێدا دەچێتە گێری ئاشەوە.

**کەوچێز** (سن.): ئەسکوێ، کەوچکی گەورە.

**کەوخۆر:** دەنکە هەرە گچکەکانە لەنێو هێشووەترێیاندا، کە لەپێش ئەوانی دی سووردەبن.

**کەودو:** ماکەرێکی مێیە بنرێتەوە تا نێرەکەوانی لێ کۆبێتەوە و ڕاو بکرێن. چەند داموسکێکە لەنزیک ماکەوێکییەوە دادەنرێنەوە تاکوو کە ماکەوەکە خووێندی کەوی دی بەدەنگییەوە بێن و بکەونە ناو داوەکەوە.

**کەودەری:** باڵندەیەکە بەقەد قەلەمونەی دەبێ و هێندەی شەش کەوانە بنگووێ و دندووکی لەجیاتی وەی، کە سووربن زەردن، پەڕەکانی تەنیشتی دەقدەقن و خاڵخاڵن لەلای براوزستیان ڕەنگی بۆرە تەنها لەنێو بەفرێدادەژی و سەری پەڕەکانی سپییە هێلکەشی وەهی قەلەمونەی دەچێ هەرچەند بەلەش زۆرگەورەیە، بەلاَن بەشێوە هەرکەوە. گۆشتی خۆشە. (هەر.) کەودڕی.

**کەودەن:** نازیرەک، تەنبەڵ، گێل. ـــ ی: نازیرەکی، تەنبەڵی، گێلی.

**کەومار:** باڵدارێکی ئەفسانەییە، گوایە سەری وەک مارە و لەشیشی وەک کەو. *

**کەوەت:** کەوێت.

**کەوور** (سوور.، خۆ.): لەپێشدا بە بەردێکی زۆر زل و پێش هەڵدێریان کوتووە، چیا، کێو، ماه، (ڕەوا.) گەلی، خەرەند، کەنداڵ، هەڵدێر. لە ـــ کەوتن: لەهەڵدێرێ هەڵدێران، هەڵدێری کێو و کەندالاَن و مای و گردان. (ڕەوا.) کەوڵ، کەوڵی نانی و تیتر. ـــ کردن: کەوڵکردن. (خۆ.) پەنا، پەسیوێکە لەچیایاندا، کە بارانە نەیگرێتەوە و هەتاویشی کەم کەم وێ کەوێ. (باک.) بەرد. بزووکەر، نیشانەیێکە. (جا.) ئەشکەوت.

**کەوڕک** (بابا.): جوورە هەرمێیەکە. (شا.) گەوەڕ.

**کەوڕنگان** (زا.): جوورە دانەوێلەیێکە لە گرانیدا تێکەڵی گەغی دەکرێ و دەخورێ.

**کەوڕێشک:** کەرویشک. ـــ ە (ئەردە.): کەرویشکە. هەژانی سەری دەغڵ و شیناوەردیانە بەبا.

**کەووز** (باک.): ئارەزوو، ویست، ئیشتیا، تاسە، هەوەس. ـــ ا خووە پێ شکەناندن: هەوەسی خۆ پێ تەخت کردن.

**کەوژاندن** (باک.): (باک.) کەوشاندن، فڕێدان، گێژکردن.

**کەوسەڵ** (باک.): کیسەڵ.

**کەووش:** تایاخ، سۆلک، سۆل، پێڵاو، پێتاو، پاپۆش، پالاَ، پێلاَ، تسەک. (هەورا.) دەشتێکی چۆل و بێ ئاوەدانییە یا چیایەکی وایە. (بار.، ڕەوا.): گژوگیای بەهارێیە وەکوو ڕێواس و کەنگر و پنک و ئەسپنگ و ئیتر. (ڕەوا.) هەنگڵ. بن ـــ: بنهەنگڵ.

**کەوشاندن** (باک.): فڕێدان. (باک.) گێژکردن.

**کەوشە** (ئەردە.): لغاوەی زار. دارێکیشە، کە لکێکی بە ژێرزەوی دابیەن و لەدوور سەری لەزەوی بێننەدەرەوە.

**کەوشەدارینە:** (باک.) پێدار، پێدارینە، تەقتەقیلە، قەبقاب.

**کەوشەک:** گەمەی سێبازێنێ.

**کەوشەکۆنە:** پێڵاوی کۆن.

**کەوشەکێن:** کەوشەک، کەوشێن.

**کەوشەن** (ئەردە.): زەوی و زارێکە بەسترابێتەوە بە دێیەکەوە. (گەڵ.) سنوور. مەیدانی کشت و کاڵ و ئاژاڵ لەوەڕاندنێ، جاڕ، پاوان.

**کەووشدروو:** کۆشکار، (فە.) کەوشدیر، سۆلدروو، سۆلکەر، پێلاَودروو.

**کەوشدروون:** پێلاَودروون.

**کەوشدۆز:** کەوشدروو.

**کەووشی سەرپایی:** کەوشی سەرپێیی.

**کەوشک** (شو.): باوێشک.

**کەوڕشکاری:** پەنا و پەسیوی ڕاوێیە.

**کەووشکەن:** شوورێنێکە کەوشی تێدا دابکەنرێ، ئاسانە، ئاستانە.

**کەوشۆ** (هەر.): تێکەڵبوونی چێشت و چتی دیکەیە یا تێکەڵ بوونی ماست و دۆشاوەو.. هتد.

**کەوشێن**: کەوشەکێن، کەوشەک.

**کەوشین** (باک.): گێژبوون.

**کەوشی چەک**: کەوشی بێ پانیە.

**کەووک** (لو.، فە.): کەو، چتی شین.

**کەوکەمانە**: برینێکە لە مەلاشوو پەیدادەبێ.

**کەوکەندەر** (باد.): جوورە کەوێکی گەورەی زەردباوە.

**کەوکەوە** (ئەردە.): کەوکەبە، دارێکی سەرچەماوەوەیە گۆیەکی پۆلایینی مشت و ماڵدراوی پێوە هەڵدەواسن، لەکەل و پەلی پادشایان.

**کەوکردن**: لە کەودانی دانەوێڵە.

**کەوکورت** (باک.): گۆگرد.

**کەووگ** (ئەردە.): شین، کەوود.

**کەوگەوبوون**: شین هەڵگەڕان، ڕەش هەڵگەڕانی شوێنێک لە ئەندامی لەشی گیان لەبەران بە هۆی زەبرێکییەوە، کە لێی درابێ.

**کەوگری**: شیوەن، شین و شەپۆر و گریان.

**کەوگێز** (هەورا.): ئەسکوێ، کەوچکی گەورە، چتێکی کلک درێژی دەم پانی کونکونە لەمس یا لەفافۆنە چێشتی توندی پێ تێدەکرێ و کەفی چێشت و گۆشتی پێ دەگیرێ.

**کەوگی** (ئەردە.): گەنەی ئاژاڵان.

**کەوگیر**: کەفگیر، چاپاڵێو، چاپارزن، مووچ، پلاوپارزن. (هەورا.) سەرەند، (هەو.، موک.) کەو. کەوگیری پلاوێ.

**کەوگیرە**: کولکێکی پانە و کونکونە لەسەر قەبرغان دێت دەردەبێ و نێرتکدارە، (موک.) چاپارزن، پارزۆنگ.

**کەوول**: کەڵپۆس، پێستی خۆشکراو، پۆس، پۆست، پێست و بەتووکە و بەبەری قاپووتەوە دەدرێ بۆگەرمی. (ڕەوا.) دەمی چەقۆیە، کە کەلەن کەلەن بووبێ.

**کەوڵی نانی**: کەوڵێکە لە قەراغ تەندوور ڕادەخرێ بۆنان لەسەرکردن.

**کەووڵ**: پێست، چەرم، کەڤل. ـــ کردن: کەڤلاندن، چەلتاندن، خرتک کردن، پێست لێکردنەوە، پێست لێ داماڵین. ـــ کران: کەڤلین، جڤلین، پێست لێکرانەوە. ـــ ی نانی: سفرە، (هەورا.) سەخردان. ـــ ی ئاردی: سەختیان، سەردۆڵە. ـــ ی خەز: خەز.

**کەوولاندن**: بڕوانە: کەوولکردن.

**کەوڵە** (ئەردە.): مۆرگەکەوڵە، چتی شینی کەوەلە، شوێنی ڕووتەنی زیخەلاتی شینە. چیای بێ گیاو درەخت کە تەنها زیخ وبەرد بێ.

**کەوڵەکۆن**: بۆمرۆڤێک بەکاردەبرێ، کە پیرو قڵخن بێ و پەکی کەوتبێ.

**کەووڵپۆست**: کەوڵێکی تایبەتی خۆشکراوی تیسکنە بۆ لەسەردانیشتن.

**کەووڵکران**: چەلتین.

**کەووڵکردن**: گوروونی پێستی گیاندار. بۆخستنەژێردەست و کەنەفت کردنی کەسێکیش بەکاردەبرێ.

**کەوڵۆ** (خۆ.): دەمی چەقۆ یا داس و تەوەرداس و چتێترە، کە کەلێن و کەچ و کرووچی لێ پەیدا بووبێ.

**کەوڵۆس**: شوێنێکە ئاودایدرێبێ، ناوی دێیەکیشە لە ناوچەی خورماڵ.

**کەوڵی** (موک.): بێشەرم، سەڵیتە، بێ ئابڕوو.

**کەوڵێدان**: کەوکردن.

**کەوڵی نان**: سفرە.

**کەومار**: کەوێکە سەری وەماری دەچێ پێشەوە دەدات و وەکو کەوی دەخوێنێ، کە بخوێنێ هەموو کەوێک خۆ دەشارنەوە.

**کەون** (هەو.): کۆن. کووێن، سیپال. ـــ ە: کۆنە.

**کەونە فرۆش**: کۆنەفرۆش.

**کەونەفرۆشتن**: کۆنەفرۆشتن.

**کەونەفرۆشی**: کۆنەفرۆشی.

**کەونینە**: ئەنتیکە، چتی زۆرکۆن، مرۆی کۆنەساڵ.

**کەونینەخانە**: ئەنتیکەخانە، مۆزەخانە.

**کەوو**: شین، مۆر.

**کەووت**: دارێکی زۆرسەختە کەوچکی لێ دروست دەکرێ، داماوی براشم کلیشەی لەسەر هەڵدەکەند.

**کەووتەر** (فە.): کۆتر. (فە.) ـــ باخی: کۆتری کێوی.

**کەوور** (زرا.): شاخ و تەلان. بزنی سپی.

**کەوورک** (جا.): ئەشکەوت.

**کەوورو تەوری** (گەرد.): شاخی بڵند.

**کەووشک** (فە.): کرێژی سەر، تۆشکەی سەر.

**کەووک**(فە.): کەو، چتی شین.

**کەووو** (فە.، دەر.): شین، (هەورا.) کەوە، شینێکی کاڵی ئاسمانییە،

**کەوهار**: جوورە هەڵپەڕینێکە.

**کەوێ**: کەوا، کورتەک، کولەجە، کولۆجە. (هەو.) کەوای درێژ، سایە. بۆ هاندان بەکاردەبرێ، لەمنت کەوێ.

**کەوێت**: کەوت، دارێکی جەنگەڵی زۆر ڕەقە، لە ڕەواندزێ کلیشەمان لە سەرهەڵدەکەند، کەڤۆت. لەلای گەلێک تیران بە مێگەلی ماڵاتان دەڵێن. بڕوانە: کووێت.

**کەوێژە**: کەوچکی ئاسن.

**کەوێل**: خانووی ناوباغ، ئەشکەوتی گچکە.

**کەوێن**: خاوێن، خاوێنەر، بەرگەر، ڕەنێوهێن، ڕەنێوهێنەر، بەرێوەبەر.

**کەوی**: خانەکی، ڕام، حەمایەت، دەستەمۆ، متۆ، لینی، کەدی، کەیی، ماڵی، ماڵی بوون. باڵندە یا گیان لەبەرێکە لە ماڵێدا دەستەمۆو ڕام بووبێ. (ڕەوا.، مام.، سوور.، پیرە.، موک.، بالە.) پزی، پزوو، ڕنووە بەفرێکە لە قوولایی چیایاندا بمێنێتەوە و کوێتەوە، کەڤی. (باک.) گۆشتە زوو نەهێنانەوەی برینان.

کەریە: نزم.

**کەوی بوون**: ڕام بوون، خەڕێبوون، دەستەمۆبوون، کەدی بوون.

**کەویچ**: کەریژ، کێشێکە بۆ پێوانی دانەوێڵە وەکو تەغار، ڕبە، بەمن، قەسناخ.

**کەویجە**: کەریژە.

**کەویر** (ئەردە.): دەشتی زیخەلاّن بیّ ئاو و شیناوەردی.

**کەوێری:** زیخەلاّنی بیّ ئاوی و شیناوەردی.

**کەویز:** کێشێکی دەخلّ ودانـە بەرانبـەری پێنج باتمانە، ئامانێکـەدەغلّی پیّ دەپێوریّ، چە ـ یّ، چەمەویزیّ. ئەستووندەی نیوەڕاستی خێوەتیە، کە وەکوو هاورنگییە.

**کەویژە** (جا.): کـەوژە، ئەوپارچـەدار یـا تەنەکەیـە، کـە وەکـو لـەپی دەستییەو قوولّە لـە لوولـەی ئـەو بۆریـەی دەخـریّ، کـە گـەغی پێدادێتـە خـوارەوە و کەویژەکـەش لـەنێوکونی بەرداشـەکەی ئاشـی دەکـات.

**کەویسار** (باک.): مەڕێکە سەری خالّداربیّ.

**کەوی کردن:** ڕامکردن، خەرژکردن، دەستەمۆکردن.

**کەویلّ** (ئەردە.): چارداخی نێوباغان.

**کەە** (لو.): کا.

**کەها** (هەورا.): نزیکە. (باک.) بزنی گچکە.

**کەهالّ** (ئەردە.): تەنبەلّ.

**کەهانەت** (باک.): وەعز

**کەهبڕ** (زا.): کاوڕ.

**کەهتوکولّوفت** (ئـەردە.): تێکسرماو، زەلام، زل، تەنوومـەند، قەلّـەو، درشت.

**کەهر** (زا.): کەر.

**کەهرک** (باک.): کاریلە.

**کەهروبان** (زا.): کارەبا.

**کەهرێز:** کارێز.

**کەهریز** (لو.): کارێز.

**کەهل:** پیر، بەتەمەن، گەورە.

**کەهنی** (باک.): قۆچەقانی، کانی.

**کەهێلّ:** مرۆڤی سست و تەنبەلّ.

**کەهی:** کەوی، ڕام.

**کـەهیا** (کـە.): بـاوەڕپێکراوی پادشـا، گـەورە، سـەرۆک، سـەردار.

**کەهیر** (زا.): گوویّ کەر. کاوڕ، کاریلەی ساوا.

**کەی** (هـەورا.) کـەینیّ ؟، (هـەو.) کەنگیّ ؟، چ کـاتێکی ؟. ـ دەچیە قوتابخانە ؟. (هەورا.) چۆن، چلۆن. (هەو.) کـاک، شا، پادشا، مـیر، خونکار، وەکو کەیخوسرەو، کەیقوباد.

**کەیا** (باک.): کوێخا، برا گەورە، گەورەی ئاوایی.

**کەیار** (باک.): قاییم، مەحکەم، پتەو.

**کەیارک** (زا.): کارگ.

**کەیان:** براگەورە، شاهەنشاهان، سولّتان، جیهان. (باک.) لێکەوتنەوە، ژانران، ڕژنی کەرە لیّ پەیدابوون.

**کەیاندن:** ژاندن، کەرە لیّ پەیداکردن، مەشکەژاندن.

**کەیانی:** کەسێکە یا خێل و تیرە و هۆزێکـە بـەندیواری بـەخێڵی کەیانـەوە هەبیّ. جیهانی.

**کەیەلّ:** چارداخ، خانووێکە بۆهاوینان لەنێو باغاندا بکریّ.

**کەیبانوو:** کابان، شاژن، خێزانی مـیری، کـەیوانوو، ژنێکـە بەسـەرماڵیّ ڕابگات و کاریکات.

**کەی بەکەی:** زۆرلەمێژە، دەمێکە.

**کەیخا:** کوێخا.

**کەیخودا:** کوێخا، کەدخودا، کەدخوا، کەفخوویّ.

**کەیخودایی:** کوێخایی.

**کەیس** (باد.، باک.): دەرفەت، هەل.

**کەیف:** شادی، شـادمانی، بـەزم، بـەزم و ڕەزم، ئاهـەنگ، خۆشـی دلّ. (خو.) ویست کار.

**کەیفەرات** (باک.): دەمار، کانیسە، (غیرەت).

**کەیفخۆش:** شادمان، دلّخۆش، دلّشاد. ـ بوون: پشـکووتن، لـەخۆشیان گەش بوونەوە، دلّکرانەوە. ـ ی: شادی، (باک.) شالغی، شاهیانەت.

**کەیفکردن:** خۆشڕابووڕادن.

**کەیک:** کێچ.

**کەیکف:** کێکف.

**کەیکووا** (ئەردە.): مـەردومی کارزان، ڕاوێژ پێکراو.

**کەیل:** پڕ، تژی، تـەژی لەخـەم و خەفـەت، ئـالّۆز. کـەلاور. (هـەورا.) چارداغی نێوباغییە. کزوخەفەتبار، پەرێشان. تێر.

**کەیلان:** ئافرەتی تەڕلان، جووان، خۆش ئەندام.

**کەیلەکۆن** (زەن.): کەلاوە.

**کەیل کردن:** پڕکردن لە خەم و خەفەت.

**کەین:** نێوان، میانە.

**کەینۆو** (فە.): کابان.

**کەین و بەین:** پیلان، فروفرلّداخ، ڕەتم، پچەپچ، قومەقوم، قەمسئوون، تەگبیر، تەگبیر و ڕازێکە، کە بە نهێنیی لە نێوانی چەند کەسێکیدا بکریّ بۆ کردنی کارێک. هاتووچۆ، بێنەوبەستە، ئاشنایی، دۆستایەتی.

**کەینیّ** (هەو.): کەنگیّ، کەی.

**کەیوان:** ئەستێرەی زوحەل. (بابا.، سەق.، کە.، جا.) کابان، (کە.، جا.) کەیوانوو. خێزان. (کە.) ئەستێرەی کاروانکوژە.

**کەیوانوو** (فە.، هەورا.): کابان، کەیبانوو. (فە.) پیرێژن.

**کەیهان:** کەیان، جیهان، گێتی.

**کەیی:** کەوی.

**کەیێز** (زا.): داری مۆرد.

**کەیێل** (کە.): ئاوردەستخانە. کەلاوە کۆن. پڕ، تژی.

**کەیین** (باک.): برا گەورە، کاک، کەیان.

**کپ:** دەرگـاو پەنجـەرەی چەسـپ، کـە بـا بوویّری نـەبیّ. بیّ دەنـگ، بیّ هەست، بیّ خوسـت، مـات، کشـومات، دەمکوت. کیپ، تـەپ، هەسـتی گوویّ بەستران، گوویّ گران.

**کپەوبوون:** بێدەنگ بوون، کپ بوون.

**کپ بـوون:** مـت بـوون، بێدەنـگ بـوون. گـوویّ گـران بـوون، جـووت بوونی دەرگاو پەنجەرە و چتی تر.

**کپ و کلاّ:** بێدەنگ و جودا.

**کپی** (هەورا.): بێدەنگی، هێمنی، ئارامی، کشوماتی.

**کپیان** (فە.): ماندووبوون، فل بوون.

**کت** (باک.): پارچەیە لەووشاندا بۆ وێنە: (کور ـــ دس ـــ تان) ٣ کتە، (کور ـــ دە ـــ وا ـــ ری) چووار کتە واتە پارچەیە. بێدەنگ. ـــ بوون: کپ و بێدەنگ بوون. ختە، ختتە (بۆدەرکردنی پشیلە) بەکاردەبرێ. (باک.) تاک، تاق. ـــ و جووت: تاق و جووت.

**کتابچە:** کتێوچە، دەفتەر.

**کتاف** (باک.): کونجی.

**کتان** (باک.): پەچە، پێچە، پەردە، (زا.) کوتان.

**کتانی:** پەچەیی، پێچەیی.

**کتە:** وەلأمێکی سادە. ختە، ختتە، پشیلەی پێدەردەکرێ. (هەورا.) پشیلەی پێدەردەکرێ.

**کتتە** (کە.): ختتە (پشیلەی پێدەردەکرێ). (زا.) پشیلە. کەمندالّ بکۆخێ پێی دەڵێن کتتە. ـــ کت: ختتەخت.

**کت بەچە** (هەورا.): بێچووەپشیلە.

**کتری:** کەتری، چاپەز. (باد.) گیای کرتی.

**کتک** (هەو.): پشیلە.

**کتکالّ:** کچێ، لەگەلّ ئافرەتی وەکو ووشەی کچێ بەکاردەبرێ. ـــ ئابێ: کچێ وەرە.

**کتکەکێفی:** پشیلەی کێوی. ـــ لە: پشیلەی کێوی، هووشک.

**کتکەنەفتینە:** کتکەنەوتینە، مەبەس لەکەسێکییە، کە مایەی ئاژاوە و گێچەلّ بێ.

**کتکەنەوتینە:** کتکەنەفتینە.

**کتکی** (موک.): جوورە مارێکە.

**کتۆ:** چۆن، چلۆن، کوو، چتی. ـــ یی: چلۆنی، چۆنی، کوویی، چۆنێتی.

**کتوپڕ:** لەپڕا. کوتوپڕ.

**کتووت** (باک.): دانیشتنەوە، دووبارەدانیشتنەوە. (زا.) بەیات بوونی نان و چێشت بەنانی ووشک و کۆنیش دەڵێن.

**کت و کووێڕ:** کووێڕ و لەش پەڕپووت، کوت و کووێڕ.

**کت ومت:** کوتومت.

**کتێب** (ع.): پەرتووک، پەراوێکی نووسراو یا چاپکراوە لە بابەت هەر زانیارییێکییەوە بێ.

کتێب

**کتێو:** پەرتووک. ـــ خانە: پەرتووکخانە.

**کتێیک** (باک.): قرچەی ئاوری.

**کچ:** (ڕۆژ.) تە، دتە، (سەق.) کەنی. (دەر.، جەبا.) دۆت، دووێت، (هەو.) کیژ، قیژ. کەچک، (جا.، سەق.) کەنیشک، (هەورا.، زەن.، شەبە.) کناچە، (ڕۆژ.، گل.، دا.) تە، دوویت، دۆت. ئافرەتێکە هێشتا مێردی نەکردبێ، مندا لّی مێیینەی باوک و دایکە.

**کچانە:** وەکو خوو و ڕەفتاری کچان، چتێکە هەر لە کچان بووەشێتەوە.

**کچانی:** کیژی، کەنیلە، کیژانی، وەکوکچان، کەسێکە لەسەر خوو و شێوەی کچان بێ و وەکچان بچێت.

**کچەتیو:** چەتیو (کچی هەتیو)، لەکاتی تووڕەیی و جنێودا بۆئافرەتان بەکاردەبرێت.

**کچەزا:** منداڵی کچ، نەوەییێکە لەکچەوە.

**کچەزازا:** منداڵی منداڵی کچ.

**کچەمام:** دۆتمام، ئامۆزایەکی مێیینەیە.

**کچک** (باک.): چکۆلّە، گچکە، بوچکلانە.

**کچکە** (ئەردە.): چتی گچکە، چتی بوچکلانە. (خۆ.) دەدانی شیلەی ڕولأخانە، شیلە.

**کچۆلّە:** کچی گچکە و بچکۆلأنە و منداڵ.

**کوولە:** مەرگەماسی، گیایەکی کوژندەیە.

**کچوولە** (باک.): دەستەگوریس یا کەندرێکە، کە لەنێو ئاوێدا خووسابێ.

**کچێ:** کمکمە، کیژێ، کەنی، کەنیلە، کیژکۆک، لەکاتی دوواندنێدا بەکاردەبرێ.

**کچێتی:** بڕوانە: کچێنی.

**کچێلێچ:** قوولکەیەکە مریشکان لەخۆلّێیدا دەکەن و خۆی تێدا دەگەوزێنن.

**کچێنە:** ڕەشکێنەی چاو.

**کچێنی:** کەچێنی، کەچانی، بن. ـــ لابردن: لەکچێنی خستن. ماوەیەکە، کەئافرەت بەکچیتێیدا بمینێتەوە. پەردەیەکە، لە زێی ئافرەتدا بەیەکەمجار چوونەلای نامێنێ و خووێنێ لێدێ، بەو خووێنەش دەڵێن، کە لە زێی کچ دێ لەکاتی چوونەلای لە یەکەمجاردا. خوو و ڕەفتاری کچان.

**کچێنی دار:** بندار، خام.

**کچی مۆردار:** کچی مۆر نەشکاو.

**کخ:** قخ، قخە، پیس، پیسە، زاراوەی منداڵانە. ـــ ە: قخە، پیسە، زاراوەی منداڵانە.

**کخس** (باک.): قیسکەی پیوازی.

**کخک** (باک.): کۆخە. ـــ کرن: کۆخین.

**کخکخ** (باک.): قخقخ.

**کدابوک:** (باک.) دومبەلاّن.

**کدارک** (باک.): دومبەلاّن، کارگ.

**کدوو:** کوولەکە. کودی.

**کدوولیفکە:** جوورە بڕکە گیایەکە کوولەکەیەکی بەقەد باینجانێکی ڕەشدێنێ لەنێو کوولەکەکەدا توورەکەیەکی دێنی کونکونە وەکو لفکەی وایە چەند دەنکێکی تێدایە فڕێدەدرێ بە کیسەکە خۆ دەشۆردرێت، لفکەشامی.

**کر** (باک.): کردەوە، کار، پیشە. بووزوو، ڕایەڵی جۆلاّ، شالّی ڕانک و چۆغە، مەهۆلّ. (باک.) نووکی نێزە. (باک.) قوللەی کێوی. (باک.) سەرەوژێر.

**کڕ:** کڕێن، کڕێل، زەوی سەخت و ڕەقەن. ـــ ی جۆلاّیی: خانووت، هەرە. (باک.) بزنێکە گسووێ ی کورت و کۆکرابێتەوە. (بابا.) کورک،

مریشکێکە لەسەر هێلکان هەڵبنیشێ بۆ هەڵهێنانی جووجیلان. بێدەنگ، خامۆش، ووست. ـــ بوون: ووست بوون. ـــ کردن: بێدەنگ کردن.

**کرا** (فە.): کرێ.

**کراچی** (فە.): کرێچی.

**کراز**: قاییم، مەحکەم.

**کراژ** (ئەردە.): مێوی هەنگووینی. کاژ، کارژی مار.

**کراس**: پۆشاکێکی یەک تووێ و قۆڵ و بەرۆکدارە لە ژێر جلکانەوە لەبەر دەکرێ، (هەورا.) گچی، شەوۆ. (بار.) نیوسێ، نیوحۆقە.

**کراسەکردن**: بەسابوونێکی بەزی دەڵێن، کە بەتەواوی کولاَبێ و بڵقی گەورەگەورە هەڵبدات.

**کراسەمارانە**: کراسی ماری، کەراسی مار، کیفی ماری، تووێشک، کاژ، کیفمار، تفرەمار.

**کراس زرێ**: چتێکە لە زرێ لە چەشنی کراس دروستکراوە لەکاتی جەنگیندا لەبەر دەکرا.

**کراسی فانۆس**: بەرگی فانووس، بەرگی چرا.

**کراس قلقانی**: جوورە گۆرانی و بەستەیەکە.

**کراسی ماری**: تووێژی ماری، کیفی ماری.

**کراش** (ئەردە.): مێوی هەنگووینی، خڵت و خاشی چتی.

**کراشۆ** (باک.): گەرماو.

**کراک** (ئەردە.): کرکراگە.

**کراکە** (ئەردە.): کراک.

**کراگ**: کرکراگە.

**کراڵ** (ئەردە.): کرێن.

**کران**: جێ بەجێ بوون، بەجێ هێنران. پەشیمانی.

**کڕان**: (هەورا.) کڕێندران، کڕنای.

**کرانەبەرد**: چەقێن، کرێن، (هەورا.) چەکڕ. ـــ ی بڕین: دەربوون. ـــ ی گوڵ: پشکووتن.

**کرانەوە**: قەبوون. کرانی چتێک دوو یا چەندجاران. تروخانەوەی قورگ بە هۆی سەرماوە، لێکرانەوە.

**کڕاندن**: ڕنین، خەرتاندن، لابردنی چتێک لەسەر چتێک بەلووتی چتێکی تیژ.

**کڕاندنەوە**: کرۆستنەوەی ئێسک، گۆشت لە ئێسک کردنەوە بەددان یا بە چەقۆ.

**کڕانن** (ئەردە.): کڕاندن.

**کڕاننەوە**: کڕاندنەوە.

**کراو**: کارێکە کرابێ.

**کڕاو**: کڕ ڕاو، (کە.) سەندراو. چتێکە کڕینرابێ ئێسکێکە، کە کڕێنرابێ.

**کڕاوە**: کراوەوە. ئێسکێکە، کە کڕێنرابێ.

**کراوەوە**: دەرک یا پەنجەرە و چتێکی ترە، کە کرابێتەوە و ئاوەڵەبێ، لۆکە و خوری و چتی وایە، کە هەلاجی و شە کرابێ، چتی شێ و والاَ.

**کربوکۆش**: کردوکاش، خەباتکار.

**کرە** (باک.): کەر. گەیشتنی گاوئاهەن (گاسن) بەزەوی ووشک.

**کڕە**: ـــ ی ئاشی، ـــ ی دەستاڕی، جوورە دەنگێکە وەکوو دەنگی لەیەک خشانی دووبەردان بەنهێم. کرین و پاک کردنی چەڵتووکە. چتێکە وەکو بەرداش بازنەکەی سەرەوەی لە شووڵی دروستدەکرێ لەدووایە بەچەند دارەبییەکی ناوەکەی پڕدەکرێتەوە و کڕەی چەڵتووکی پێدەکرێ.

**کڕەکڕ**: گرەگری چەڵتووکی و دەغڵ لە ئاشی کردن.

**کڕەکڕۆ**: نێوی دەنگێکییە، کە لە ئاشی و دەستاڕییەوە دێت، بنکڕاندنی مەنجەڵ. کڕەی یەک لە دووای یەکتری، کڕڕ و هووڕ، کڕڕ و هۆڕ.

**کڕەکردن**: چەڵتووک سپی کردن. مەبەس لە پێزانینی کەسێکییە لە چتێکی، فیسارەکەس بە فیسارەچت کڕە دەکا واتە زۆری حەز لێیەتی.

**کرباس**: کرێکە لە لۆکە دروستکرابێ، جاو.

**کڕبە**: بێدەنگ بە، ووس، ووست.

**کڕبوون**: کپ و بێدەنگ بوون، کش و مات بوون.

**کڕبوونەوە**: ژێربوونەوەی منداڵ، نەمانی دەنگ و باسێک، کە بلاوبووبێتەوە.

**کرپە**: خورپە، کورپە. ـــ لەدڵکەوتن: خۆرپەلەدڵکەوتن.

**کرپەکرپ**: دەنگی خواردنی تووروتریزو و نیتر، کورپەکورپ، خورپەخورپ، دەنگی شکانی چتێکییە یا لێک ترازانی دوو یا چەند چتانە.

**کرت** (ڕەوا.): قامیشی مێیە، کەناوی هوڵۆڵ نەبێ و بکرێتە گەسک.

**کرتان** (زا.): گامێشی خەساو.

**کرتاندن**: کەرتاندن، قرتاندنی چت بەددان.

**کرتانکرن** (زا.): خەساندنی گامێش.

**کرتە**: کرچە، دەنگی شکانی چتی ناسکە بەددان، دەنگی بڕینی چتییە بەددان، خرچ، خرپ، خرپە، خرتە.

**کرتەک** (باک.، زا.): کونێکە یا قوولکەیەکە بارانە لەبەفریدا قووڵی کردبێ، بەفرێکە بەستبێتی و وی بە هۆی بارانەوە درناڵ بووبێ.

**کرتەکرت**: خرتەخرت، خرچەخرچ، خرپەخرپ، کرکر، کرچەکرچ.

**کرتەمر**: پێن، جا، مەر، بەرمووڕ.

**کرتک** (باک.): کرکرۆچکە.

**کرتکرن** (زا.): نیشانەکردنی دار بە لەت کردنی بەمشار.

**کرتمرت** (زا.): کەل و پەل.

**کرتناک** (زا.): تیرۆک.

**کرتۆپە** (نەهـ.، بار.): پارەڵماسی، (هەورا.) سێفەزەمینی، (کرما.) سێفەزەمینە، (شار.) خەرکەگازۆلە.

**کرتوو** (بابا.، کۆ.): قامیشی چیغی، گیایەکی باریکی قایمە وەک زەل دەستەگوڵ و شەتڵی پێ دەبەستری.

**کرتووپان** (باک.): تێکدان، شێواندن، گوڵەدان بەگۆڵە. (زا.) بەرگێکە باش دروست نەکرابێ.

**کرتی** (ڕەوا. ، کۆ.): کتری، گیایەکە گوڵی درێژی هەیە بە بەرەکەشی پەنیرگشت، داپیرۆشک دەڵێن، کە درێژە و بەناسکی دەخورێ، گیایەکە بە ووشکی دەبێتە گسک و پشیلەی هەوای لێپەیدادەبێ. کرتی ئەژنۆیەک بڵندتر دەبێ گەڵایەکانیشی وەهی قامیشی دەچێ، کرتوو.

**کرچ**: کاڵ (بۆ میوە و گۆشت)، بەڵام لەگەڵ کاڵ نەبێ بەکار نابرێ، میوەی نەگەیشتوو، گۆشتی کرچ و کاڵ، نەکوڵیاگ. (فە.) چرچ، قرچ، سیس، ژاکیاگ.

**کرچە**: کرتە، دەنگی بڕین و شکانی چتییە یا پسانی دەزوو یا ددان کێشانییە.

**کرچەکرچ**: قرچەقرچ، کرچەیەکە یەک لە دووای یەکتری، کرچ و هوڕ، کرچەکرچی زۆر، کرشە.

**کرچ بوون**: نیوەکوڵ بوون بۆ وێنە نیمە پەز (گۆشت)، نیوەکوڵ بوون.

**کرچیان** (ئەردە.): چرچ بوون و ژاکان.

**کرخاو** (کە.): خەوی خەست، خەوی خۆش.

**کرخەو**: کەسێکە بەتەواوی خەوی لێکەوتبێ، خەوگران.

**کرد** (ئەردە.): تەلان، باخچە.

**کردار**: کردەوە، کار، حەمات، پیشە، ڕەوشت. کشت و کاڵ، کردەوە.

**کردە**: کردەوە، پیشە، کار. ـــ پەشیمان بە، نەکردە پەشیمان مەبە.

**کردەپەشیمان**: کەسێکە لە کردەوەیەکی خۆی پەشیمان بووبێتەوە.

**کردەوە**: کار، کر، ئەو کارەیە مرۆڤ بیکات، کردار.

**کردەی** (هەورا.): کردن، کرن.

**کردگار**: خودا، یەزدان، ئاهورامەزدا.

**کردم، کەمردم**: ووشەیەکە وەکو گیرەم بەکاردێنرێ: تۆ بچۆ لای فیسارەکەس کردم لەوێ نەبوو واتە گرتم یا گیرەم لەوێ نەبوو.

**کردن**: (هەورا.) کەردەی، کردەی، (باک.) کرن، بەجێ هێنانی کارێک. لێ ـــ (بابا.): لێچوون، وێچوون. ئارەزوو پەسندکردن، ئەمن دەکەی: مێردم پێدەکەی؟. تێکەوتن. کانگردن، کێش هاتن، پەرداختن. تێکردن. کرن، لێکردن.

**کردنەوە**: ئاوەڵەکردنەوەی دەرکە و پەنجەرە و ئیترە، چتی گرێدراوکردنەوە: گرێ هەڵوەشاندن، شکاندنی ڕۆژوو. ـــ بڕین: دەرکردن، خاوکردنەوەی قفڵی داخراوە بەکلیل، ڕزگارکردن و کردنەوەی پیاوێک، کە لەژنەکەی بەستراوبێ و بتوانێ لەگەڵی دروست ببێ. کارێک دوو سێ بارە کردنەوە، چنینی میوە و گوڵ و ترێ و ئیتر شکاندن و لەتکردنی دار، دەست بە کارێکی گرنگ کردنەوە، جشات (حفلە) کەی بە ووتارێکی کورتانە بکەوە. شێ کردنەوەی خوری و لۆکەیە بەکوتک و کەوان و ئیتر. ئاوەڵەکردن، شکاندن، قفل و ئیتر. وازبوون، پشکووتنی گوڵ و ڕەنگ و ڕوی مرڤان. شیکردنەوە، ڕێگاکردن، خاوکردنەوە بۆ هەمووچتێک. تەردەستانەکردن، پەلەکردن، تاڵووکەکردن. دروستکردن، سازکردنەوە.

**کردنەیەک**: کرن یەک.

**کردوو**: کردووکێش، خاکەنازێکە دەم پان دووددانە ئاڵقەی پێوەیە پەتێک لە ئاڵقەکان دەخرێ زەلامێ ڕای دەکێشێ بۆ هەڵکەندن و قووڵکردنی دێراو و چتی تر.

**کردوکۆش**: تەقەلا، هەوڵ بۆ ژیان.

**کردووکێش**: ئاسنێکی دەم پانی کلک درێژە بەدووکەسان دێراوی پێ هەڵدەدرێتەوە، کردوو، کەرەک.

**کرژ**: کشت، بادراو، دەزوبەن و چتیتری زۆربادراو و لوولدراو. هەڵقرچاو، کەوڵەڵە لەبەرگەرمای، ئاوری ـــ بووە. (کە.، دەر.) گرژ، دژ، کورووژم، لوول. ـــ هەڵاتن: کرژ هورامای. خێرا، چەسپان، قۆچاخ.

**کرژەوکردن**: لوولدان، توندکردن، کەمرج کردن.

**کرژبوون**: باخواردن، هەڵقرچان، لوول بوونی موو.

**کرژکردن**: بادان، لوولکردنی موو و خوری، خێراکردن، زووکردن.

**کرژهەڵاتن**: هەڵقرچان.

**کرژی**: کشتی، گرژی، خێرایی.

**کرس** (شکا.): زبل، کرش و کاڵ.

**کرس کێش**: زبڵ کێش.

**کرشە** (شا.): ڕەفتار، شێوە، قرشە، دەغڵی کۆکراوەوە وگێرەکراو، کلۆرش، کولۆش.

**کرش و کاڵ**: کرس، زبڵ.

**کرک**: چەچە، دەنگ. ـــ کردن: دەربڕینی وشە یا دەنگ بە دەم و دوو. (باک.) لووی نێودووگی مەڕانە.

**کرک** (جا.): سفت وڕێک، دەشتێکە گوڕەپان و ڕاستبێ، شووێنێکە تەخت و ڕووتەنبێ، بۆ کشت و کاڵ پەسندکراو.

**کرک**: ڕەپ، کۆر.

**کرکاسە** (ڕۆژ.): قاپ و قاچاخ.

**کرکاڵە** (بار.، کە.): باڵندەیێکە چەنگ و چاوی وەهی بازی دەچێ سەری زلە فیتووی لێدەدا بەقەد قەلەموونەیێکی دەبێ.

**کرکان** (باک.): خوران. ـــ دن (باک.): خوراندن.

**کرکای کرک** (کە.): کرک. کاکی بە کاکی.

**کرکەفتن**: کرکەرتن، کورک بوونی مریشک.

**کرکەوتن**: کورک بوون، کرکەفتن.

**کرکەوتوو**: مات، بێدەنگ، کورک، مریشکێکە لەسەر هێلکان کورک بووبێ.

**کرکر**: کرتەکرتی لەوەڕێ، دەنگی لەوەڕینی گیان لەبەران.

**کرکر**: (ڕەوا.) دەستاڕ یا ئاشی چەڵتوکی. (هەو.) بنکڕ، شیر یا چێشتێکە بەبنی مەنجەڵێوە دەنووسێ. (گەر.) ڕەشاییەکەی بنی مەنجەڵییە. (گەر.) کرێژی بندووگی مەڕانە.

**کرکراوۆک**: کرکروچکە.

**کرکراکە**: کراک، کراکە، کونی گوێچکە.

**کرکراکێ** (هەورا.): کەسمە، کەرسمە.

**کرکراگە** (کۆ.، بابا.): کرکرۆچکە، کراگە، کونی گوێچکە.

**کرکرانە** (باد.): کرکرۆچکە.

**کرکرە**: لوولەی هەناسە، کرکرۆچکە. جوورە ترێیەکیشە. (شەم.) سێوی بن ئەرزی.

**کرکردن**: برێتییە لە کورژتنی یەکێکی بەدزیەوە.

**کرکرک** (باک.): کرکرۆچکە.

**کرکرکاگوهێ** (باد.): کرکرۆچکەی گوێ.

**کرکرۆچکە:** چتێکی توند و تورتە لە نێوانی گۆشت و ئێسکیدایە بە تایبەتی گـوێ و لـووت لـەو پێکهـاتوون، (باد.) کرکرکاگوهێ، کرتک، (هەورا.) کرژچەڵێ، کورژچـەڵێ، کرکرژک، (ڕەوا.) کرکرە، کرکرارژک، کاکـەرک، قرقرتـە، کـەرک، قرقرتۆک، کوریـژەک، کوڕکورژچکـە، (پـیر. ، مامە.) کرژژە، (کۆ.) قرتێنە، (باک.) کرکرک، (کۆ.) کرکراگە، (بـاد.) کرکرانە.

**کرکرۆکە:** کرکرۆچکە.

**کرکنچک** (باک.): جەواڵ یا خورجی چکۆڵە.

**کرم:** گیانداریکی باریکە و درێژۆکورتی هەیە جۆری زۆرە، قـورم، کـورم. ـــ ی دەغلان. ـــ ی نێوزگ. ـــ برینی ماڵاتـان، کـە بـەرزنی هـەڵس چارەی دەکرێ.

**کرماج:** (دزە.) کرمانج. (ئەردە.) ـــ ی: کرمانجی.

**کرماشان:** کرمانشاه.

**کرمانج:** کرماج، نێوی هۆزێکی زۆر و گەورەیە لەکورد. بۆرەپیاو. ـــ ی: شێوەیەکی زمـانی کوردییە، کەکرمانج پێی داخووێ. ووردکردنی چـتی ناسک بەددان.

**کرمـاندن:** کرمـە لـێ هێنـان، کـەچتی ناسک بخـورێ کرمـەی لێـوەدێ.

**کرمانشاە:** کرماشان.

**کرماندن:** کرماندن، کروتن، کلوخیدن.

**کرماوی:** کرمیێ، چتێکە کرمی تێدابێ.

**کرمـە:** خرمـە، کرتـە، دەنگێکـە لـەکاتی چـتی ناسـک خواردنـدا پەیدادەبێ. گیان لەبەرانیش وەکو وولاخی بەرزە و کـەڵ و گـامێش و ئـاژاڵ و ڕەشە وولاخان، کـە جۆی دەخۆن دەنگی ـــ یان لـەزاری دێت. مرۆش، کەقەندی بکرۆژی دەنگی لێـوەدێ. (کـە. ، ڕۆژ.) کرمـەک، خشـڵی ژنان. (رۆژ. ، کـە. ، مـوک.) بەرۆولـە، چوکڵـەدارێکی چووکـە دەخرێتـە کونـی هەپەی کەوامژانە و باسک هەوجارێ لێک قایم کردووە تا دەرنەیەت.

**کرمەبەفرینە:** زەلاڵ، کرمی بەفری.

**کرمەژن:** کرمژنە، کرمن، کرماوی.

**کرمەژنە:** کرمن، کرماوی، کرم تێدراو، کرمەژن.

**کرمەک:** کرمـە، جناخـە، کرمۆکە، کومرب، جوورەخشڵێکە لە زێڕ یا لـە زێوی دروست دەکرێ وەکو بـەندێکی وایـە بـەژێر چەنەگـەدا تێدەپـەڕێ و هەردووک سەری بەقوولاپ لەکڵاوەکەی قـایم دەکرێ، کـە دەنکـەکانی وی وەکرمی دەچن.

**کرمـەکرم:** کرمـەی یـەک لـەدووای یـەکتری، دەنگی خوواردنـی چـتی ناسک و ڕەقە، خرمەخرم.

**کرمبڕ** (کە.): کرمێکە ڕیشەی دەغلان دەخوات.

**کرم خوواردە:** کرمێ، کرمێوون، کرمخواردوو.

**کرم خوواردوو:** چتێکە کرم تێیدابێ و خوواردبێتی.

**کرمدار:** کرمن، کرمێوون، پیتۆ، مۆریانە.

**کرمژن:** کرمن، کرمێ.

**کرمژنە:** چتێکە کرم تێیدابێ.

**کرمشین** (زا.): چرچ بوون و ژاکانی کاڵا.

**کرمک** (ئەردە.): زمانی قفلی.

**کرمکار** (ئەردە.): بەڵەد، شارەزا بە کارێک.

**کرمکـە:** کرمـەکی ژنانـە لـەزێڕی دروسـتدەکرێ، ژێرچەنەیـە، جـوورە نەخشێکە لە چیغ دروستدەکرێ لە وێنەی کرمەکی ژنان، کرمەک.

**کرمکوژە:** ڕێواس.

**کرمگـەنم:** کرمێکە لەنێو دەغڵی پەیدا دەبێ.

**کرمکیز** (زا.): نەخۆشێکە لەکرمی زۆری ناوزگەوە پەیدادەبێ.

**کرمکیس** (باک.): نەخۆشیەکە.

**کرمن:** کرمێوون، کرمدار، کرمی، کرماوی، پیتۆ، قیندار، قین لەزگ.

**کرمنشـاندن:** کۆنکـردن، ووردکـردن، ڕێـک کوشـین، جیـق دەرهێنـان، لەناوبردن.

**کرمنشین:** کۆن و وورد و خاش بوون، جیق دەرهاتن، لەناوچوون.

**کرمۆکە:** کرمـەک، ژێرچەنە، پارچە خشڵێکی وەکوو زنجیر وایە بـەژێر چەنەگـەی ژنـاندا تێدەپەڕێ و قوولاپی هـەردووک سـەرەکانی لـە کـڵاوی دەخرێ.

**کرمۆڵ:** کرمێوون، کرمێ، کرمـەژن، کرمۆڵ.

**کرمۆڵی:** کرمێوونی، کرمێیی.

**کرم و دڵێ لەمی** (هەورا.): کرمی ناوزگ.

**کرمووژن** (ئەردە.): کرمژنە، کرموژن، کرمۆل.

**کرم و یەهەری** (هەورا.): کرمی جەرگ.

**کرمێ:** کرمێوون، کرمـۆڵ، کرمـاوی، (کـە.) کرمـژن، کرمـی، کورمـی، کوورمۆ، کرمـەژنە.

**کرمێوون:** پیتـۆ، کرمـن، کرمـدار، کرمـۆڵ. ـــ ی: کرمـنی، کرمـداری، کرمۆنی.

**کرمێ یی:** کرمۆڵی.

**کرمی** (باک.): چڵکن، پیس، کرمێ، کرمۆڵی، (باک.) کرپال.

**کرمی ئـاوریشـمی:** جـوورە کرمێکـە ئاوریشـمی هـەڵدەپێچێ، کـەکلێ، هاڵیە، کرمی هەوریشم، هارییە.

**کرمی بـەفری:** جوورە کرمێکـی سپییە بەقـەد مـەچـەکی ئەسـتوورترە و چاوی ڕەشـە منـدالان لـەژێر بـەفریدا دەری دێنـن لـەسـەر تەڵبـەردێکی دادەنێـن دەمـرێ و ووشـک دەبێتـەوە پێسـتەکەی وەکـو پۆدرەسپی وورده تۆزێکی بکەنە ناو ئاوی گەرم وەک بەفراوی لێدەکات و زۆر ساردی دەکا.

**کرمی چیکڵدانـە:** جوورە کرمێکـە لـەناو زگ و لـەناو کوولـەکـەدا پـەیدا دەبێ.

**کرمی خەیار و ترێزوو و شینایی:** هارییە.

**کرمی دار:** مۆرانە. ـــ ی: کوورمۆڵی، ماشۆت.

کرمی دار

**کرمی کـەژۆکی:** کرمێکـە هەشـت سـانتیمەتر درێژە و زەردە گـەڵای داری (کـیرۆک) ێ دەخـوا و لـەنێو گەڵایـەکانی دادەژی و هەرلەوێشدا قۆزاخەی ئاوریشمی دەکات.

**کرمی گەنم:** پیتەبڕە جوورە کرمێکە لە گوڵی گەنی دەدا و دەیقرتێنێ.

**کرمی ناوزگ:** کرمی چیکڵدانە.

**کرمی میوە:** کرم.

**کرن** (باک. ، باد. ): کردن. چێ ــ: چاک کردن، دروستکردن. ئاڤا ــ: ئاوەدانکردن. دانـان: گوهـاریّ خووەکـردە گوهـیّ خـووە: گـووارەی خـۆی لـەگوێی خۆی دانا. تومـن دکـەی: تـۆ مـێرد بـەمن دەکـەی؟. ــ دەر: دەرکــــردن. بەرڤــــەکرن: قــــەدکردن، چەماندنــــەوە. بدەرکــــردن: دەرکـردن.وازلێهێنـان: دەسـتیّ خـووە ژێکـرن. داکـەندن: ژخووەکـرن. لەبەرکردن: ژبەرکرن. ژبەر ــ، ڤەکرن: داکەندن. ژبەرڤەکرن: نەهێشـتن. ژهەڤ ــ: جوویّ کردنـەوە. ژهەڤ کـرن دەر: گـریّ کردنـەوە. ژپێشـڤەکرن: بەشانازییەوە کردن. لخوو ــ: پۆشین. ــ ەیەک: یەک کردن.

**کرناس** (زا. ): گڕوی، دەم و چاوی ئاوڵاوی.

**کرنە** (جا. ، فە. ، کە. ، زەن. ، هەورا. ): قڕنوو.

**کڕنەک** (جا. ، فە. ): قڕنوو.

**کڕندە** (شا. ): مرازێکی کەوچک دروستکردنێیە لـەپاش گەڵاڵـەکردنی بەشە قووڵاییێکەی پێهەڵدەکەنرێت. کڕپار.

**کڕنگ:** کرنک، بی هەنجیر، گەرچەک. تۆوی هەنجیری بیّ گەرچەک.

**کرنــگ:** قڕنـوو، کـەوەی گەنــە. (ئـەردە. ) گەرچــەک، بــیّ هــەنجیر.

**کرنۆش:** بڕوانە: کرنووش بردن.

**کڕنوو:** قڕنوو، گرنک، کڕنۆش.

**کڕنووش:** کڕنۆش، کڕنوو.

**کڕنووش بردن:** سەرچەماندنەوە و دانەواندن لـە پێش یەکێکی لـە جیـاتی شێواز نوواندن و ڕێزگرتنی.

**کرنی** (زا. ): کرنک، کەوەی گەنە.

**کرواس:** کراس.

**کرۆتەی** (هەورا. ): کرۆژتن.

**کرۆتن:** (هەورا. ) کرۆتـەی، کورۆتـەی، کرۆژتـن، کورۆژتـن، داکرۆژتـن، کۆرۆچنای، ماشاندن، خواردەمەنی ڕەق بەددانان هـاڕین، کـە ڕەقیـب دی من و یار پێکەوە نیشتووین لەرقان وەکوو سەگ پێت بکرۆژی دەم و لێـوی دەکرۆت.

**کرۆچ:** کرۆز.

**کرۆچانن:** کرۆتن، کرۆژتن.

**کرۆچەڵە:** کرۆژەڵـە ئێسقانێکە نەرم بەدەم دەفەی شانەوەیە.

**کرۆچەلیّ** (هەورا. ): کڕکرۆچکە.

**کرۆچەلکی** (هەورا. ): کرکرۆچکە.

**کرۆزڕۆ** (هەورا. ): کیاتیسوو، تووێسی.

**کرۆژە** (مامە. ، هەورا. ، پیر. ): کرکرۆچکە.

**کرۆژتن:** کورۆتن.

**کرۆستنەوە:** کوورساندن.

**کرۆسک:** ڕەق، سەخت، پتەو، قاییم.

**کرۆسک:** دارە هەرمێی کێوییە بە بەرەکەشی هەودەڵێن هـەرمیّ کێویلـە. (هـەورا. ) مرۆکێویلـە، (بـاک. ) سـەربی، گـرک، دارێکیشـە لـە هـەرمێی موتربـەدەکریّ بـەرێک دەگریّ وەک هـەرمیّ کێویلـەی وایـە بەرەکـەی زۆر ڕەقە.

**کرۆشتن:** کورۆژتن. *

**کرۆک:** نێوەڕاست، نێرک، نێرۆک، نـێرتکی پیـوازی. نێـوی دارێکییـە. (کە. ) ڕەگ و ڕیشەی داران، بنچینەی چتی.

**کرۆکس:** کرۆسک.

**کڕۆڵ:** کلۆڵ، ڕۆژە ڕەش، بەدبەخت.

**کڕۆن** (هەورا. ): قوورئان.

**کروو** (جا. ): ڕەوەند.

**کرووچ:** چتی لەت و کوت.

**کروور:** پێنج سەدهەزار (نیوملیۆن).

**کرووز:** کـوڕووز، (کۆ. ) بۆکـڕووز، بۆنکـڕووز، (هـەورا. ) بۆنڕووز، بۆنـی سـووتانی لباد و خـوری و ئیـتر. ــ کـرن (بـاک. ): تاشـین، هەڵدانـەوی تووک. پیری داکەوتوو، هەژار.

**کروزان:** نووزانەوە، (هەو. ) هەڵپڕووزان.

**کڕووزانەوە:** نووزانەوە، (هەو. ) هەڵپڕووزان، گریانی منداڵ، زوورانەوەی منداڵ، چرووسانەوە.

**کرووزاندن:** کوڕووزاندنەوە.

**کرووزاندنــەوە:** کوڕووزاندنــەوە، کزاندنــەوە، چرووســاندنەوە، گریـاندنی منداڵ.

**کرووزانن:** کرووزاندن، لەناوبردن.

**کرووزە** (موک. ): گوریزە، پرچێکە یا کاکۆڵێکـە بەقەفقـەف و پێـچ پێـچ ڕاوەستێ.

**کرووزەکرووز:** (هەورا. ) قرووزەقرووز، کلووزەکلووز، کوورووزیانەوە.

**کرووزەڵە:** بڕوانە: کرووژەڵـە.

**کرووزکرن:** بڕوانە: وەکرووزاندن.

**کرووزیانەوە:** کلۆزیانەوە.

**کڕووژ** (کۆ. ): گورێزە.

**کرووژەڵە:** کرۆچەڵـە، ئێسقانێکی نەرمـە بەسەرەدەفەی شانەوە.

**کرووژم:** کورووژم، زیپک، کووژە. ــ هەڵاتن: خۆ وێکهێنان لـەسـەرمان، هۆرتروشــکیای، (هــەورا. ) ژوورکــەردەی، پرنســـین، (هــەورا. ) کورووژەکردن، خۆکورووژم هەڵێنان: خۆوێکهێنان، پەلکین، مەلساندن.

**کرووژم هەڵێنان:** هۆرتروشکنای.

**کڕووس** (ئەردە. ): کەڕ، نەژنەوا.

**کرووساندنەوە:** کرۆستنەوە، کڕانەوە.

**کرووستنەوە:** بڕوانە: کرووساندن.

**کرووسک:** بڕوانە: کرۆسک.

**کرووش** (ڕەوا. ، هەو. ): بۆبانگ کردنی گوێدرێژان بەکار دەبریّ. (کۆ. ) کووڕش، (هەورا. ) کوڕڕۆ.

**کڕووش:** بازرگان، کڕیار وفرۆشیار.

**کڕوفرۆشیار:** کڕوفرۆش، بازرگان. ــ ی: سەوداگەری، ئاڵ ووێر.

**کرووڤ** (باک. ): کریڤ.

**کرووک:** بڕوانە: کرۆک.

**کرووکاس** (فە.): هۆڕ و گێژ و مات.

**کرووکاسی:** گێژ و ماتی.

**کرووکاش** (خانە.، موک.): هەوڵ و تەقەلا، گردوکاش، کردوکۆ.

**کرووکاشکەر:** هەوڵدەر، تەقەلادەر.

**کرومات:** کپ، بێدەنگ. ـــ ی: کپی، بێدەنگی.

**کروهوڕ:** کرپەکرپی زۆر.

**کرویت:** کبریت، شخارتە، شەمچە، لێخرێنە، گۆگرت.

**کرێ:** مزێکە بەرانبەر بە کردنی کارێک بدرێ بەکارکەر، کراهە، مز، مزە، جەمەکە، (باک.) کری، پێمزگ. بە ـــ دان: کرێدان. بە ـــ گرتن: کرێ گرتن.

**کرێبار:** کرێ ی بار، کرێیەکە بدرێ بۆهەڵگرتنی بارێک، باربەپارە هەڵگرتن.

**کرێبارچی:** کەسێکە باری بە پارە بۆ ئێرە و ئەوێ بباث، باربەکرێ هەڵگر.

**کرێباڵە:** درەوەنیەکە بەکرێ درووێنەبکا.

**کرێت** (ڕەوا.): ناشیرین، ناحەز، دزێو. (باک.) کولۆوکەرسەک. ـــ ی: ناحەزی، ناشیرینی، دزێوی.

**کرێچ** (زا.): سوواڵەت. (باک.) پاڵە، کارگەر. ـــ ی: کراچی، کرێ گرتە، (باک.) تەفاریک، کرێدار، کەسێکە بەکرێ لەماڵێکی یا دووکانێکی یا لە شوێنێکی دابێ.

**کرێچێتی:** کرێگرتەیی، کرێداری.

**کرێخانوو:** پارەی کرێچێتی.

**کرێدەسی:** سەپانی.

**کرێز:** کەل، کەلپک، کیشار، تۆشکەی سەری کەچەلان و برینداران، قرێژ، چڵک، توویژ، تۆژ، تۆژکە، (کە.) کرێش، تووریشک، تووێشکە، کرێژک. ـــ ی هەنگووینی: (باک.) پێندڤە.

**کرێژاوی:** کرێشاوی.

**کرێژک** (زەن.): کرێژ.

**کرێش** (هەورا.): تۆشکەی سەر، کرێژی سەر، چڵکی بەسەریەکدا کەوتووی ووشکەوە بوو. ووشکەڵی شانەهەنگووین.

**کرێشە** (موک.): جوورە چتێکی کرژی تەنکە لەلۆکە دروستدەکرێ.

**کرێڤ:** کەسێکە منداڵی لەباوەش بگرێ بۆ خەتەنەکردنی، کریڤ.

**کرێڤا** (زا.): کرێڤ.

**کرێکار:** کرێگرتە، پاڵە، ڕەنجبەر، سەپان، کەسێکە بەپارەگیرابێ بۆکارکردن. ـــ ی: کرێگرتەیی، پاڵەیی، ڕەنجبەری، کارکردن بەپارە.

**کرێگرتە:** کرێکار. ـــ یی: کرێکاری.

**کرێل** (ئەردە.): شوورێنی کرێن، زەوی سەخت. (هەورا.) کلیل. کریکە، بێ گوێچکە. کەسێکە قسە وەرنەگرێ.

**کرێن** (ڕەوا.): جێگایەکە لە بەر زیخ و وورده بەردان و خیزی دەغڵی لێنەڕووێ و بێ پیت بێ، زەوی چەقێن گاسن کاری لێناکات، چکل، چرچک، بەردەلان، ڕەقان، زاخە، چەکڕ، کرێنەبەرد، کرانەبەرد، ڕەقێن، زەوی چەوولگی سەخت.

**کرێندران:** کران، ڕنران، لەخەرتدران، خوران.

**کرێو:** دۆستێکە خزمایەتی ببێت.

**کرێوە:** بەفرێکە بەدەم باوە بباری. (دەر.) وەشت، (باک.) بابووک، بلێک، بادەڤ، باندەر.

**کرێوکرێو** (هەو.): ترەوەژە.

**کرێ:** بێدەنگی، ماتی.

**کرێ:** مزێکە بەرامبەر بە کردنی کارێک بدرێ. *

**کڕیار:** بکڕ، داخوواز، داواخوواز، کڕندە، بسێن.

**کڕیاری:** داخووازی، بکڕی.

**کڕیاگ:** کڕدراو، سەنراو.

**کڕیانەوە** (ئەردە.): کرانەوە، وازبوون.

**کریاو:** کراو. ـــ ە: کراوە.

**کریاوە:** کراوە، کریاو.

**کریز** (ڕەوا.): شلەمەنیەکە لەچۆڕانەوەیدا نەپسێتەوە و وەکو دەزوو یەکتری بەرندا وەکو هەنگووین و هەموو جوورە شیلەیەک.

**کریزۆک** (باک.): نرخ، مز.

**کریس:** ووتەیەکە کارژۆڵەی پێ بانگ دەکرێ.

**کریسک** (باک.): چریسکە، تروسکە ئاوور و ڕووناکایی، پزیسک. (بار.، گەر.) سیسرکە.

**کریف:** کریڤا، (باک.) دۆستۆ، کریو، کاکە، کەیۆ، هاورێ، هاوا ڵ، برادەر، کە کوردێکی یەزیدی بانگی کوردێکی پسووڵمان بکات دەڵێ: کریڤۆ واتە کاکە، کەیۆ. ئەگەر کوردێکی پسووڵمان منداڵە فەڵە یا یەزیدییەکی لە باوەشیدا سوننەت بکرێ یا بە ئاوەژوو پیاوەکە بۆ ماڵەبابی منداڵە کە دەبێتە کریو، کە زۆری ڕێز لێدەنرێ و یارمەتیشی دەدرێ، ئەڤینیان بە ئەندازەییێکی لە نێوانیاندا پەیدادەبێ، کەلەنێوانی هیچ خزم و زاوایەکیدا پەیدانەبووبێ، لەباکووردا کوردان بانگی فەلان بکەن کریڤیان پێدەڵێن وەکولە گەرمێن و کووێستانێدا دۆستۆیان پێدەڵێن.

**کریڤاتی:** پیشەی کریڤی.

**کریڤو:** لەکاتی بانگ کردنی کریڤاندا بەکاردەبرێ.

**کریل:** کرێکە.

**کرێلە:** کریل.

**کرین:** سەندن، سەنن، سەندنی چتەمەک بەدراو.

**کرین** (زا.): کریان، خرین.

**کرینەوە:** مەبەس لە ڕزگارکردنی کەسێکییە لە تەنگ و چەڵەمەییێکیدا، ئەم قاپووتە ئەم زستانە منی کریەوە، تۆ دارات کریەوە: واتا ڕزگارت کرد.

**کرینچک:** پەرچەم.

**کریو:** کریف.

**کز:** (باک.) نکاری، کولووڤان، گر، گرس، مەجووجە، خەمگین، لێوشۆڕ، پەست، توویەن، دامردوو، پەرۆشدار، بەپەرۆش، بێ کەیف، داماو، خدۆک، گووج، دژ، مات. چرای ـــ: بێ شۆق، شۆقکەم. سەوزایی

ـــ: بێ کەیف. (ڕەوا.) بۆ، چەوری، چەورایی، ڕۆن. کەم، بێهێز: ئەمساڵ ئاو ـــ ە: کەمە، چراویا ئاگر یارەشەبا ـــ ە: بێهێزە.

**کزان:** ئێش پێ گەییشتن، ئێش پێگەیین.

**کزانەوە:** کرووزانەوە، کولانەوە، چووزانەوەی برین یا لووت. کزاندن، (هەورا.) کزنای.

**کزاندنەوە:** ئێش پێگەیاندن، چووزاندنەوە، پرووزاندنەوە، کرووزاندنەوە.

**کزانن:** کزاندن، کزاندنەوە، توزانن، چووزانن، پرووزانن.

**کزە:** تینی سەرمایە بەدەم باوە، سروەی با. سڕ، تۆزن، تووڵ کرن، بای سارد، بای سەخت.

**کزر:** چەرمەووشک، نیوەووشک.

**کزە:** ـــ ی دڵ: قژە. چزە، قرچە، ئێش، دەنگی مێش و سووتانی چت، دەنگی برژانی کەباب.

**کزەبا:** بایەکە بەدەم سەرماوە، بای سووک، بای فێنک، سروەبا.

**کزەکز:** چزەچزی گۆشت و چتی تر لەسەرئاووری، کزەی یەک لە دووای یەکتری. ـــ لێ پەیدابوون: ژانی لێپەیدابوون.

**کزەلۆک:** لەش کرووژم هەڵاتوو، کەسێکە لەشی کورووژم هەڵاتبێ وویکهاتبێ لەبەر کزی و سەخڵەتی، کزۆڵە.

**کزەی جەرگ:** مەبەس لە ڕۆڵەی خۆشەویست.

**کزەی دەروون:** ئێش و ئازاری دەروون.*

**کزبەلۆک** (باک.): گیایەکە.

**کزبوون:** شەمۆتەدان، گزهاتن، بەپەرۆش بوون، پەنگخواردنەوە، زیزبوون، زوویربوون.

**کزخاندن** (زا.): هەڵپاچینی درەخت بۆ جووانی و بەخۆداهاتن.

**کزر:** نیوەشیشک، هەرچتێکی تەرکە کەمێک هیشک بێتەوە ـــ ی پێدەڵێن، گیاندار و سەوزاییێکە، کە خۆی گرتبێ و لە خەم ڕەخسی بێ.

**کزران:** تەڕایی و ئاولێ ووشکبوون، ڕوولەووشکی کردن، شوێنێکە، کە هەرچەندە باران بباریێ ئەو هەر کزربێ.

**کزراندن** (باک.): ڕەوشەنکردن، بڵێسەدان، تروسکاندن، هەڵپرواندنی خوری.

**کزربوون:** ڕوولەووشک بوونەوەکردن. خڕەڵەبوون و بەخۆداهاتنی گیانداروسەوزایی.

**کزربوونەوە:** کەمێک هیشک بوونەوەی چتی تەڕ.

**کزری** (باک.): کەسێکە بە هۆی باوەڕی یا پیاوەتێکییەوە بەندیواری بەکەسێکی یەوەبێ. بارێکە لە نێوانی تەڕایی ووشکیدا.

**کزرین** (باک.): ڕەوشەن بوون، بڵێسەدان، تروسکان.

**کزمووک:** دژی چەور.

**کزک:** چزڵیک، چزیلک.

**کزکە** (ئەردە.): کزکۆڵە، کسکە. چزیلک، کسکە.

**کزکردن:** کەمکردنەوەی گڕی چرا و ئاگر، خەمگین و پەرۆشدارکردن.

**کزکزین** (زا.): داچڵەکین، تالێپاتن.

**کزکۆڵە** (ئەردە.): کزۆڵە، شفرەی بەرازی، مرازێکی دەم تیژە لە دارتاشی بەکاردەبرێ.

**کزکۆڵەکردن** (ئەردە.): کزۆڵە کوریکردن.

**کزمک** (زا.): سەرکوژەری گەفییە.

**کزن:** گیایەکی دەستچێنە، دانەکەی خڕە لەناوێدا دەیخووسێنن دەیدەن بە گایان لە نێوانی نیسک و هەرزنێدایە، کلێنە. (موک.) گلینە، (جا.) گاگۆز، ڕۆنەکەشی بۆ خەرکانە باشە.

**کزنای** (هەورا.): کزاندنەوە.

**کزنگ:** گیایەکە.

**کزنێکە:** شلکێنە، هەویرێکە زۆرتەڕ بەکەوچکی نەکەوێتە سەر پشتی ساج و نەبرژێت لەگەڵ ڕۆنیدا تریت دەکران وەکوو کەلانە بۆ خواردن.

**کزۆک** (باک.): بەدبەخت، بێ تین، هەژار.

**کزۆڵە:** گیانداری کزۆڵ.

**کزۆڵەبوون:** کززە لۆک بوون.

**کزوان** (باک.): قەزوان.

**کزوەت** (باو.): خۆراکدارە.

**کزووری** (باک.): بۆکرووز، کاڵای خوری هەڵپرووزاو، بۆنی خوری سووتاو.

**کزوهوور:** کزەکزی زۆر.

**کزێرە** (باک.): گیایەکە.

**کزنێکە** (بابا.، شا.): شلکێنە، هەویرێکی شلە بەدەست پاندەکرێتەوە بەسەرساجیدا بۆ برژاندنی، شلکێنە هەویری زۆرشلی سەرسێلی سوورەوە کراوەوە، کەرۆنیشی تێدایە، دەیبرژێنن و دەیخۆن.

**کزی:** پەرۆش، خەم، درژانگ، بێ کەیفی، زەبوونی، خەفەتباری.

**کزیاتی** (بار.): چەوری، چەورایی، کزی.

**کزیان** (ئەردە.): چووزانەوە، تۆژیان، سووتان.

**کزیانەوە** (ئەردە.): کزانەوە. (ئەردە.) تووژیانەوە، کلۆزیانەوە، سووتان.

**کزیر** (باک.): گزیر.

**کزیلک** (خۆ.): چزیلک.

**کژ** (ڕەوا.): هەوا. کەژ، کەش، ڕاوەستانی بارانە و خۆشی هەوایە. ـــ دان: هەڵبرینگاندن. کات، گۆنەر، پشکساڵ، ئێستا کژی تۆوە یا کژی شەتڵی تووتنە. (کۆ.) نۆبە، هەل، جار، چەل، حەل، کەرەت، باو. کزر، نێر. ـــ بوونەوە: کزربوونەوەی زەوییە دووای بارانە، کە جووتی لێ بکرێ، کەش، گەردو وەرد. (شن.) کشت، زۆربادراو، هەڵقرچاو، بۆچەرم و قاقەز و چتی تر بەکاردەبرێ، کەلەگەرمان بەسەری هاتبێ.

**کژەبارانە:** بارانێکە لەکاتی خۆیدا بباریێ.

**کژبلۆک:** گیایەکە بنکەکەی دەخورێت.

**کژک:** تەرزە. (ئەردە.) کەژوو، قەیاسە، تەنگەی وولاخی، کەلەخوری یا دەزووی دروستەکەن. (باک.) فرفرە.

**کژگ** (هەورا.): تیلمەیەکی درێژە دروستدەکرێ و تەنکە قەیاسەی وولاخی پێدەبەستری.

**کژڵ**: پارچە کرێژێکی نێو ددانانە.

**کژوورە** (باک.): کژولە.

**کژوورەک** (زا.): خێزەرە.

**کژوولە**: کژوورە.

**کژوومات**: کشوومات، بێدەنگ و خاموش.

**کژێتی**: باوێتی، کاتێتی.

**کژێلۆک** (زا.): گیایەکە بنکەکەی بە پاکراوی دەخورێ.

**کس**: کسس، وشەیەکە بۆ تێبەردانی سەگان بەکاردەبرێ.

**کسس**: ووشەیەکە بۆ لێخوڕینی مەڕان بەکاردەبرێ، پیخ، گس.

**کسسە**: هڕڕە، هسە، قش، پیخە، بۆ لێخوڕینی مەڕان و بزنان بەکاردەبرێ.

**کسەکسە**: کسسە.

**کسپە** (کە.): تیژڕۆیی و گەڕان، دەنگێکە وەک ئاوێ بەسەر ئاووریدا بکەی وایە، کڵپە، بلێسەی ئاوور.

**کسپەکسپ**: کسپەی یەک لە دووای یەکتری.

**کسپ و کۆ**: کفت و کۆ، گری ڕق و تووڕەییە، داخ، ئەوەندەم لێدا یا جنێوم پێدا یا قسەم پێ کوت تا ـــ ی دەروونم دامرکاو داخی خۆم پێ ڕشت.

**کسک**: کەسک، سەوز. (باد.) چزلیک، چزیلک.

**کسکە** (هەورا.): چزیلک، چزلیک. (ئەردە.) کزۆڵە.

**کسکس**: بۆ تێبەردانی سەگان بەکاردەبرێ، چەند سەگێکی پێ بەشەڕ دەدرێ، هەیکس کس، (هەو.) دەی، دۆیها.

**کسکسین** (باک.): گریان، هاوارکردن، ناڵاندن.

**کسکۆڵە** (ئەردە.): کزۆڵە.

**کسکیانەوە** (ئەردە.): کزانەوە، خەمناک بوون.

**کسم** (ئەردە.): کارپیشە.

**کسۆک**: سە، سەگ. بۆ جنێویش بەکاردەبرێ.

**کش**: کششە، کشکش، کشش، بۆدەرکردنی باڵندان بەکاردەبرێ. بێدەنگ، مات، بێ هەست و خوست. سوواربوونی یەکێک لە ئەندامەکانی شەترەنج بەسەر شادا.

**کشان**: کەش هاتنی چت. کێش هاتن، گەڕانۆک، داکشان، کشران، کێشران. خوشین، تێپەڕین، بووڕین، ڕابردن، بەسەردا ـــ: داپۆشران. تارمایی بەسەردا ـــ: تارمایی بەسەرداهاتن.

**کشانەوە**: گەڕانەوە دوواوە، (هەورا.) گێلایەوە، پاشەکشە.

**کشاندن**: کێشان، کێشاندن، خشاندن، داکشاندن، لفکەکە بکشێنە، کەش هێنان بەچت.

**کشانکشان**: وورده وورده کشان و تێپەڕینی چت، فیسارکەس ـــ هات.

**کشاو**: مدە (ع.) (~)، کەشە، کێشە، کەشیدە.

**کشاوی**: بێن درێژی، پشوودرێژی.

**کشایەوە**: گەڕاوە، پاشەکشەی کرد.

**کشە**: بۆ دەرکردنی باڵندان بەکاردەبرێ، کش. (کە.) هەزارپێ. (باک.) کەدی دار، لکی گچکە، خەڵفی یەکساڵی.

**کششە**: بۆ دەرکردنی باڵندان بەکاردەبرێ.

**کششەکش**: کشکش.

**کشپەڵ**: کشپل.

**کشپل**: کشپەڵ، پشکەڵ، (دەر.) قشپل، پشقل.

**کشت**: تۆو وەشاندنە بە زەویدا. (شن.، ڕژ.) کرژ، (شا.) کورژ، زیک، (جەبا.، ڕۆژ.) باف، وەرزی کشت و کاڵ، بۆ دەزوو و بەنێکی زۆر بادراو بەکاردەبرێ. ـــ کردن: بافکردن. دانەرێڵەی چنراو. (باد.) توند و تۆڵ، چالاک.

**کشتاوکشت** (هەو.): پشتاوپشت. ـــ گەڕاوە: پشتاوپشت گەڕاوە.

**کشتەک**: بەن یا پەڕۆ یا ئاوێکە نزا (دۆعا) ی نۆبەتێی بەسەردا بخوێندرێ، تابر، نۆبەتێ بڕ. بەن یا دەزووی کشت چەنددراوە دەزوو یا بەنێکە، کەمزۆر پێکەوە بابدرێ. پووشووی چەخماخی. دەزووی بادراو، دەزووی بادریاگ. چەند داوە دەزووێکی پێکەوەبادراوە. بەجیوە و خەنەوە مرزی ئەسپێیون هەڵیدەگرن.

**کشتک** (دزە.): ووشەیەکە مریشکی پێدەردەکرێ لە کاتێکیدا، کە نزیکی تەپکە و تەڵەی بێ بە تایبەتی لە کاتێکیدا، کەباڵندەی لەسەر نیشتبێ چونکوو بەکشە باڵندەکان هەڵدەفڕن.

**کشتگا**: کشتگە، شوێنی کشت و کاڵ.

**کشتگە**: کشتگا، مەزرا.

**کشت و کاڵ**: کردار، (کە.) کشت کێڵ، تۆوکردن، شەتڵ چاندن لە زەویدا، زەوی کێڵان.

**کشت و کیاز** (هەورا.): بێستان.

**کشت و کێڵ** (کە.): کشت و کاڵ.

**کشتیار**: خاوەندی کشت و کاڵ.

**کشک** (باک.): گەمەی شەترەنجێ.

**کشکە** (هەورا.): بژاری بێستان.

**کشکش**: کشەکش. (ئەردە.) هەڵپەڕین.

**کشکشان**: سەماکردن لە داوەتی کشکش دا.*

**کشکشاندن**: کێشان، درەنگخستن، درەنگی بەسەرداهێنان.

**کشکشین** (باک.): کشان، درەنگ بەسەرداهاتن.

**کشمیش**: ترێی ووردی بێ ناوکی ووشک بووەوەیە. ـــ ی: جوورە ترێیەکی سپی و سووریشی هەیە دەنکی خڕ وورده وبێ ناوکە.

**کشنیژە** (ئەردە.): گژنیژە، بەری گیایەکی زۆربەتام و بۆنخۆشە.

**کش و مات**: کژومات، کپ، ئارام، بێدەنگ، بێ خشپە، هیدم، هێمن. ـــ ی: کژوماتی، کپی، ئارامی، بێدەنگی، بێ خشپەیی.

**کشی**: بەلەز رابورد.

**کشین**: خوشین (بۆمار).

**کف**: بۆگەن. ـــ کرن: بۆگەنبوون.

**کفای** (هەورا.): کۆخین، کۆکین.

**کفە** (هەورا.): کۆخە، کۆکە. دەنگی داگیرسانی شەمچە و ئاگرییە، کففە.

**کففە:** دەنگی هاتنە خوارەوەی خوونێنە لەکاتی سەربڕینی ئاژاڵاندا.

**کفەکف:** دەنگی داگیرسانی شەمچە و ئاورییە، کففەی یەک لە دووای یەکتری.

**کفت:** توزێکی زەردی جووانە وەک زێڕ وایە لەڕووی هەندێ چت دەدرێ بۆ جووانی. زۆر ماندوو و شەکەت، (هەورا.) مانیان. ــ بوون: پرووکان. ــ کردن: پرووکاندن. (ئەردە.) خوڕە.

**کفتە:** چێشتێکە گۆشتی قیمە و برنج یا بروێشی بەسەلک تێدایە، کووتە، کووفتە، کووتلک، گرک، ئارۆک: کفتەی گۆشتی، سوورکراوەوەیە.

**کفتە و شۆربا:** شۆرباوی کفتەی، چێشتی کفتەی.

**کفتە و شۆربای** (هەورا.): کفتە و شۆرباو.

**کفتە و شۆروا:** کفتە و شۆرباو.

**کفتک** (زا.): شەمچە، شقارتە، لێخرێنە.

**کفتکاری:** بەکارهێنانی کفت لە هەندێ چتاندا بۆ جووانی.

**کفت و کۆ:** سفت و سۆ، ئێش و ئۆف، کسپ و کۆ. ــ دامرکان: (باک.) بەنجین.

**کفتێ** (هەورا.): کفتە.

**کفتی:** زۆرماندوو و شەکەت بوون، ماندوویێتی، شەکەتی.

**کفر:** داری‌تەررو (هەو، کە.) دارێکی بۆنخۆشە بەژنێک بڵند دەبێ گوڵی شینە و بەری ووردە گەڵای باریک و گوڵێکی شینکەڵەی هەیە هەرکەسێ بەرەکەی بخوا زگ و زاناکات. (کە.) تەررو. لەخڕوچەم و دەم چۆماندا شین دەبێ.

**کفرجار:** جێگایەکە داری تەرووی زۆر لێبێ.

**کفرێن:** جوورەیارییەکە بەجگ دەکرێ.

**کفکار** (باک.): کارگ.

**کفکۆ** (باک.): کف، بۆگەن.

**کفکێ:** کێکف.

**کفن:** (هەورا.) کەفەن، خەڵات، قەرقەل. ــ کردن: کەفەناندن، بلووری یا خامێکە، کە لەتەرمی مردوو بهاڵێ.

**کفنای** (هەورا.): کۆخاندن.

**کفندز:** کەسێکە گۆڕی مردووان هەڵبداتەوە بۆ دزینی کفنەکەی.

**کفارک** (باک.): کارگ. (باد.) کەوان.

**ککە:** ققە، قەقە، کەکە، لەزاراوەی منداڵاندا خوواردەمەنی شیرینە.

**ککەو:** کەووت.

**ککرت** (باک.): گۆگرد.

**کل** (لو، فە.): ڕەوانە. ــ کردن: ڕەوانەکردن، ناردن. (هەورا.) کڵە، سوورمە، سوورمەی چاو. ــ لەچاوکردن: چاوڕشتن. جودا، جیاواز، جیا، کلا، جووایەز.

**کلێ:** ــ ی پردان: گومبەزی پردان، تاقی پردان. ــ ی دیزە و گۆزان: دیزە و گۆزەی لەسەر یەکتری کەڵەکە دەکەن و ئاگری تێبەردەدەن بۆ سوورکردنەوەیان. گڕی ئاووری.

**کلا** (بابا.): کەڵلای یاری جگێنێ و مەرمەرێنێ. لاوە، بەلاوە، شایف، کلێ، کەنارکەوتوو، جێگای ــ: پەرگە، پەناگە، گۆشە. ــ بوون: شایف بوون، کەلی بوون، لادان، کەوتنە کەناری چت. خۆ ــ کردن: خۆلادان، لاتریسکە.

**کلاس:** پۆلی خوێندنگە.

**کلاسک** (کەل.): ئاسکی نێر.

**کلاش:** کەڵاش، پێلاوێکە سەری لەبەن یا لە دەزوو وبنەکەشی لەپەڕۆ یا لە چەرم دروستدەکرێ.

**کلاشەکردن:** هەڵگیرانی قوڕە بەپێلاوەوە لە کاتێکیدا، کە زەوی بووبێ بەقوڕ.

**کلاشچن:** کەسێکە سەری کەڵاشی بچنێ.

**کلاشدروو:** کلاشچن.

**کلاشدم:** دووپشک.

**کلاشکەر:** کەلاشکەر.

**کلاشکەرە** (کە.): زیندەوارێکە وە قالۆچەی دەچێ بەلاَن بۆر و درێژ و ناشیرینە.

**کلاش ووریز** (هەورا.): کەلاشدروو.

**کلاشین** (کە.): ڕنین، خاوێنکردنەوە. (ئەردە.) خورانەن.

**کلاف:** کلافە.

**کلافە:** کەلاف، چەند هەودا دەزوویان ئاوریشمێکە، کە پێکەوە هەڵکراون بۆ ئەوەی، کە داوداو دەرکێشرێ و بەکار بهێنرێ. دەزووی بادراوی قەدکراو. (کە.) ماشەر، کەلافەدەزوو. چتێکە لە بەن دەهۆنرێتەوە بۆ بەستنەوەی جووانوو تادابێن و ڕام و دەستەمۆبێ، ئەم جووانووە نەکراوە واتە سرکە. کلک بەرزکردنەوەی چارەوێیە لەکاتی غاردانیدا.

**کلافەکردن:** بەستنەوەی نۆمابەکلافە.

**کلافەهەڵکەر:** گوڵەژەن.

**کلاکردن:** لاخستنی چتێک.

**کلانە:** دوگمەی گەورە.

**کلاو:** کولاو، تاقیلە، شەوکلاو، کووتۆز، کولاڤ، کۆلار، پۆشاکی سەرییە و لەسەردەنرێ و پێچی لەسەر دەبەسترێ. کلاوی شەوێ: مینا، فینا، کمک، کومک. ــ لە تۆقی سەربوون: بێ پەڵەو کەم و کووڕی بوون، سەربەرزبوون.

**کلاوە:** تۆقەسەرو تەپڵەکی کێوی و تیتر. پۆپەی کەڵەباب و نیدیکە. ئاخڵەیەکە، دروستدەکرێ لە قوڕ یا لەحەویر بەدەوری کووێرووی بەرداشیدا تا دانەرێژی نەکات. کەڵەوەی جووتی. پووچەکی زەڕڕات.

**کلاوەسەر** (کە.): سەربەکلاوە.

**کلاوەسوورە:** گیایەکی تام خۆشە گوڵی لەبەرابیدا زەردە دوایە سوورهەڵدەگەرێ، گیایەکەی وە کولیک نیسانێ دەچێ، بەلاَن گوڵەکەی گەورترە.

**کلاوەکردن:** مەبەس لەبارانە و بەفری دەنک گەورە.

**کلاوەکورە:** مەلێکە هێندەی پاسارێکییە کلاوی تیژی هەیە، سۆفەقیتە، ملوورێچک.

**کلاوەیەزنۆ** (کە.): کەشکەژنۆ.

**کلاوی بەیداخ** (ئەردە.): ئاسنێکی لووت تیژە بەسەری ئاڵای دادەکەن.

**کلاوەی پەنجە** (ڕۆژ.): مورووی گەی پەنجە.

**کلاوەی چۆکی** (هەو.): کەشکەژنۆ.

**کلاوەی زرانی** (کە.): کەشکەژنۆ.

**کلاوبەدراو**: کلاوێکی ئافرەتانە، کە لیرە یا تارانی یا چەرخی تێدەخرێ.

**کلاوبنە**: جۆرە ڕێواسێکی گەڵاپان و قوڵەبنەیە (باک.) ڕیەل، قەلاتینگ، باسکلاوە.

**کلاوبۆرە**: کلاوبۆرکە.

**کلاوبۆرگە**: کلاوێکی لبادینە بەسەر فەرەجیەوە شوان و گاوان لەکاتی بارانەیدا دەیکەنەسەریان.

**کلاوپاچە** (هەورا.): کەللەپاچە، سەروپێ.

**کلاوچن**: کلاودروو.

**کلاودار**: کلاورن، باڵندەییکە، کەلەتووکی سەری کلاوی ببێ.

**کلاودروو**: کلاوچن.

**کلاورەش** (بابا.): دەردێکە تووشی ماڵاتان دێ دووایە تەزووی دەداتە سپەڵاکی دەکۆخێ، هەندێکیش دەڵێن دەردێکی کوژندەیە دووچاری بزنی دەبێ نێوزگی هەڵدە ئاوسێ و خووێنی تێدەزێ. تورک، تورکمان، عەجەم، ترکەرەشە.

**کلاورەشە**: گیایەکە.

**کلاورۆچنە** (هەورا.): کولانە، ڕۆچنە.

**کلاورۆزنە** (بابا.، شارە.): کولانە، ڕۆچنە، کونێکە لەسەر بان دەکرێ بۆ ڕووناکی و دووکەڵ لێدەرچوونێ. (بابا.، شارە.) پەنجەرەیەکی گچکەیە زۆرترلە بڵندی لە دیواردەکرێ بۆ ڕووناکی.

**کلاوزەڕ**: کلاوزێڕ. ـــ ی: جۆرە کلاوێکی زرێدارە لە ڕۆژی شەڕێدا لەسەردەنرێ.

**کلاوزرێ**: کلاوی ئاسن لە پێشدا بۆ شەڕێ لەسەردەنرا.

**کلاوزێڕ**: کلاوزێڕین.

**کلاوزێڕین**: تەپلەزێڕین، تەپلەئالتوون، کلاوەی ژنانە، غازی و لیرەی پێدا دەدروون یا کلاوە هەرلەزێڕە لەسەر کلاوی دادەنێن.

**کلاوفەرەنگی**: کلاوێکە دەکرێ بەسەر لوولەی کوورەدا بۆئەوەی، کە دووکەڵەکەی باش دەرچێ و بانەیکێرێتەوە.

**کلاوقووچ** (دەر.): شەوکلاو.

**کلاوقووری**: جۆرە شەپکەیەکی خوریییە پاڵە و جووتێر لەبەر هەتاوێ لەسەری دەنێن لەکاتی دروێنەدا.

**کلاوکورە**: چووڕەپۆپنە، فشەکلاوە، باڵندەیەکە هێندەی چۆلەکەیەکییە ڕەنگی ڕەش و سپییە و خەتخەتە پتر لە نێو گۆڕستانانەدا دەبینرێ.

**کلاوگەرە**: کلاوبۆرە.

**کلاون** (کە.): بەکلاو، کلاودار.

**کلاونە**: کلاودار، مریشک و پەلەوەرێکە کلاوداربێ.

**کلاوێن**: گەمەیەکە بە ئەنگوستیلەدەکرێ، کلاوکلاوێن. کاڵەمستانە.

**کلاوی سەخوری جین**: (؟).

**کلاوکلاوێن**: یارییەکی دوودەستەیی یە وەک یاری گۆرەوێنی بەڵام ئەم بەکلاو دەکرێ.

**کلە** (هەورا.): سوورمە. (فە.) مێشوولەبەند، کوللە. (ئەردە.) کل. (ئەردە.) کلی پردان.

**کلەپێچ** (زا.): خشتی کال، لگبن.

**کلەدان** (هەورا.، ئەردە.): کلدان.

**کلەو**: ئاوێکە لە چۆمێکی گەورەوە بەسەر بەستێکیدابێ.

**کلەوە** (فە.): قولاپی ماسیانە.

**کلب** (زا.): کەڵبە.

**کلبوون**: گوراستنەوە، دوورکەوتنەوە، کلابوون.

**کلپە**: هالاوی گەرمای هاوینییە. (موک.) لرفە، قوڵتە، کولان، کرپە، دەنگێکیشە لەگڕی ئاوور پەیدا دەبێ.

**کلپەکلپ**: لرفەلرف، لرپەلرپ، کلپەی یەک لە دووای یەکتری.

**کلپ و هۆڕ**: کلپەکلپی زۆر.

**کلتوور**: کلدان، (هەورا.) کلێدان.

**کلچان** (باک.): فانووسی دەستی.

**کلچۆڤ** (باک.): کلچێووک.

**کلچۆک**: بڕوانە: کلچێووک.

**کلچووکە** (هەو.): ئاسنێکە وەکوو میلی وایە لەنێو کەرەستەی جەنجەڕیدا.

**کلچێووک**: چتێکی باریکی لووسە چاوی پێ دەڕێژرێ، تیلچێووک، کلچۆک، پاروشک، ملچێووک، کلچۆڤ.

**کلچیف** (باد.): کلچێووک.

**کلدان**: (باک.) کلتوور، کلدانک، (هەورا.) کلەدان، کلێ دان. کلتوور، (هەورا.) کلێدان، توورەکەیەکی گچکەیە کلی هاڕراوی تێدەکەن.

**کلدانە** (هەو.): ئاسنێکی قوڵەیە وەکوو ئاڵقە لەنێو کەرەستەی جەنجەڕیدایە.

**کلدانک** (باک.): کلدان.

**کلفەت**: کارەکەر، تەیان، تایەن، دایەن، قەرەواش، دەرماڵ. ماڵ و منداڵ.

**کلفەتبار**: خاوەند ماڵ و منداڵ، کلفەتدار، خێزاندار. ـــ ی: خاوەندێتی ماڵ و منداڵ، کلفەتداری.

**کلفەتدار**: کلفەتبار، خاوەند ماڵ و منداڵ. ـــ ی: کلفەتباری، خاوەندێتی ماڵ و منداڵ.

**کلفت** (لو.، فە.): ئەستوور، زل، زۆر، ئازاد پارەیەکی ـــ ی هەیە.

**کلفتی** (لو.، فە.): ئەستووری، زۆری، زلی.

**کلک** (فە.، شووا.): قامک. (ئەردە.) ئەنگوست. دارێکی درێژە دەخرێتە بێڵ و خاکەناز و زەنگەن و پاچ و تەورە و ئێترەوە. چتێکی باریکە لەئاستی سمتە چووڵەی یەکسم و ڕەشەوولاخ و کەر و ئێستر و ئێتر

پەیدادەبێ و سەرهەڵدەدا، دوو، دوم، (فە.) دوچکە، جوچکە، دوولـک، دیف، (بـاد.) کـووری، قلیچکـە، قلیچـەک، (فـە.) دم، دەڤیـک. ــ هەڵگرتن: دمگرتـن. ــ جووڵان: لووجین. ــ جووڵانـدن: لووجاندن. ــ براو: دوڤکورت، دم ڕار.

**کلکاز** (فە.): ئەنگوستیلە.

**کلکاف** (ئەردە.): مازوو.

**کلکانە** (فە.): ئەنگوستیلە.

**کلکـانی**: مـەردومی شـێت ووێتـە، ڕۆسـتەم پیـاوێکی کلکانییـە.

**کڵکە**: پرد.

**کلکە** (هەورا.): قـامک، تپـل. داوێنی کێو. ئـەنگوچک. چتێکە وەک مرۆر بەڵام ئەم بچووکترە و کلکێکی باریکی هەیە.

**کڵکەبێڵ**: دەسکەبێڵ.

**کلکەپاسار** (ئەردە.): گووێسوانە.

**کلکەپووتە** (هەورا.): قامکەتووتەڵە، قامکەچکۆڵە.

**قامکەتووتە**: قامکەتووتەڵە.

**کلکەتووتەڵە**: کلکە پووتە، قامکە تووتە.

**کلکەڕەقە**: ئەخشێکە لەتەوون دروستدەکرێ وەکوو کلکی ڕەقە.

**کلکەڕێوی** (بابا.): جووره ترێیەکە. گیـازەرداو، گیاسـەفرا، گیایـەکی هاوینییە ئەژنۆیەک بڵند دەبێ، قەدی کەمێک خوواره لەبنەوە تا ناوقـەدی گەڵای بـاریکی ٣ چووکـڵ دەردەکات و لـە ناوقەدیـەوە تـا سـەر چتێکـی دەردەکات وەکـوو کلکەڕێوییـە، بـەتۆزی یا بەتـەڕی بخورێ بـۆ زەرداو زۆر باشە.

**کلکەسـووتە**: زمانلووسـی، پێڕاموسـی، کلکەلـەقێ، چاپلووسـی، ڕووپایی، ڕووالـەت، ماستاوساردکردنەوە. ــ کردن: ڕووالـەت کردن.

**کلکەسووتەکە**: بروانە: کلکە سووتە.

**کلکەسووتەکێ**: کلکەسووتە.

**کلکەقنگێ**: مەبەس لە جووڵاندنی یەکێکییە بە کردار یا بە گوفتار ــ ی مەدە واتە مەیجووڵێنە و سەرمەکە سەری.

**کلکەکەڵە** (ئەردە.): کلکەگەورە.

**کلکەگەورە**: قامکەگەورە.

**کلکەلەقە**: کلکەلەقێ.

**کلکەلەقێ**: ڕووپامایی، کلکەسوویە.

**کلکەمار**: مەبەس لەچتی زۆرتاڵە.

**کلکەمارکردن**: ژەقنەکردن.

**کلکەنگوچک**: ئەنگوچک، سۆرانی.

**کلکەنما**: ئەنگوست نما، کلک نما.

**کلکەوانە** (هەورا.): ئەنگوستیلە، (بابا.) ئەموستیلە. ــ ی دروومانی: ئەنگوستیلەی دروومانێ.

**کلک نامراسێ**: (؟).

**کلک بەس** (ئەردە.): مەبەس لە کەسێکییە، کـە دەستەشکێن کرابێ، دەزوو یا بەنێکە لە قامک گرێ دەدرێ بۆ بیرخستنەوەی چتێک.

**کلک بەسە**: کلک بەس.

**کلک بلک** (فە.): قامکی شادە.

**کلک پێوەکردن**: بریتییە لە گاڵتە بەکەسێک کردن، قامک بە قوونی کەسێکی داکردن.

**کلک تەقێنە**: کلک هەڵسەنگێنە.

**کلک تیتە** (فە.): قامکە تووتەڵە.

**کلک تیلە** (فە.): قامکە تووتەڵە.

**کلک دار**: چتی خاوەند کلک، بۆکەل و پەلی دەسکداریش بەکاردەبرێ، ئەو تاوە کلکدارە لەسەر ئاورەکە داگرە. دەمدار.

**کلک قەوینە** (فە.): قامکی ناوەڕاستی.

**کـل**: کـردن. ــ کـردن (ئـەردە.): کـەنارەگرتن. نـاردنی کـەسـێک بـۆ جێگایەکی.

**کلک گرتن**: کلک بەرزکردنەوەی وولاخی بەرزەیە لەکاتی سووارببوونی دا و یا لەکاتی غاردانیدا.

**کلک گیر** (ئەردە.): قوشقنە.

**کلک مەقلی** (دەر.، هەو.): قشقەڵە.

**کلک نامراس** (فە.): قامکی نێوەڕاستێ.

**کلک نما** (ئەردە.): ئەنگوست نما.

**کلک نیشان** (ئەردە.): ئەنگوست نیشان.

**کلکۆ** (کە.، هەورا.): گڕ. ــ دامردن: دامرکانی گڕ و بڵێسە.

**کلکوانە**: کلکەوانە.

**کلک ووزە** (فە.): قامکەگەورە.

**کلک هەڵتەکێنە**: کلـک هەڵسـەنگێنە، دووقدرێژ، دووڤرەپک، کلک تەقێنە، قلیچکەهۆرتەکنێ، (باد.) زیج، باڵندەیەکە.

**کلک هەڵسەنگێنە**: کلک هەڵتەکێنە، باڵندەیێکی گچکەی کلک درێژە هەمیشە کلک هەڵدەتەکێنی.

**کلم** (کە.): چڵم، چڵمی خست.

**کلمساندن** (باک.): سەرسامکردن.

**کلمسین** (باک.): سەرسام بوون، واق وووڕمان.

**کڵمن**: چڵمن.

**کڵمیش**: کلمیس. (زا.) چڵم.

**کڵنشک**: دڕک و داڵی دەشتە، کە لە هاویناندا ووشک دەبێتەوە با دەیشکێنێتەوە دەیباتە ناو دۆڵ و دەرانەوە.

**کڵنانەوە** (هەورا.): کولاندنەوە.

**کلنجک** (کە.): کلێنچە.

**کلۆ** (هەو.): کوللە.

**کلۆ**: کەلپ، پلوور، کولۆ، کریست، پیپۆک، (باک.) کلوو، بێلوور، بلوور، بەلوور. ــ قەند: کەڵپەشەکر.

**کلۆپینک** (زاخ.، دهۆ.): سەرکی چیا، قیتکایی سەرچیایان، کەمک، کەپک.

**کلۆت**: کلۆک، کرلۆت.

**کلۆچ** (باک.): شاخی ڕەشەوولاغ و ئاژاڵان و ئیتر، قۆچ. جووره مارمارۆکەیێکی پێچ پێچە وەک بازنە.

**کلۆخ** (باک.): لەش، کاسەی سەر. (زا.) یەک سەر لە ئاژاڵ.

**کلۆر**: چۆڵ، بەتاڵ، پووچ، خاڵی، هاڵی، (هەورا.) قورژاڵ، هلۆڵ، هولۆڵ، ناوبەتاڵ. ـــ بوونی ددان: نەمانی میناکەی و دەرکەوتنی قوولایی و چاڵاییەکەی. (باک.) کوللێرەی شەکری فووکراو و نێوبەتاڵ. ـــ ا (زا.) کلۆچ. ـــ ی: هولۆڵی.

**کلۆز**: هەڵپەڵدوخاو وەکوو قەرە خەرمان.

**کلۆس**: شووێنی خۆجێیی، خۆیی.

**کلۆسک** (باد.): کوپەڵە.

**کلۆسن** (هەورا.): سندەگڵ، گڵمەت.

**کلۆش**: (باک.) بستی، کولۆش، قەسەڵ، قەسەر، سەرووت، لاسکی دەغلی دروراوە، کە لە سەرزەوی بەقیتی مابێتەوە.

**کلۆفت**: ئەستوور و زل.

**کلۆک** (جا.): کلۆت، سمت، کەلەکە.

**کولۆک**: بەکوڵ، ئەم نۆکە ـــ ە واتە دەکوڵێ.

**کلۆکە گورگە**: گولێکی تووکی سوورە وەکوو مەخمەری وایە، لەسەرەتای هاویناندا پەیدادەبێ بستێک بڵند دەبێ.

**کلۆل** (بل.): مەڕی نێوچاوان سپی. (بل.) سەرتاووسی، کەسێکە پێشەسەری تووکی پێوەنەبێ.

**کلۆڵ**: بێچارە، بەدبەخت، چارەڕەش، کولۆڵ.

**کلۆلاش** (هەورا.): گیایەکی بەرزە قۆزاخەیێکی دەنک دەنکی باریک دەگرێ ددانی پێ دەناژننەوە.

**کلۆڵی**: بەدبەختی، چارەڕەشی، مەینەت. رووشە، پەتەر، کێشە، تەگەرە، قۆرت.

**کلۆم** (هەورا.): کلۆمک، کولۆم، قفل، سەرکلۆم، کلیل و کلۆمی دار. ـــ دان: داخستن.

**کلۆمک** (موک.): کلۆم، سەری ئێسکی ڕانییە، گەی ڕانییە، کە دەچێتە نێو نێکەوە.

**کلۆیی**: کریستالی، (باک.) بێلووری، بلووری.

**کلوو**: کولوو (باد.) پاتۆرە. ـــ ی بەفری: (هەورا.) کلووەوەروو.

**کلووەوەروو**: کلوو، کولوو.

**کلوور** (باک.): کلۆر. کروور (پێنج سەدهەزارە).

**کلووک** (هەو.، ڕەوا.): گوڵ، کولوک، شکۆفەی دار.

**کلووکەگورگە**: بڕوانە: کلۆکەگورگە.

**کلووک نیسان**: گوڵی نیسانێ.

**کلێجە** (شن.): کلێنجە، کلێنچکە.

**کلێدان** (هەورا.): کلدان.

**کلێژە** (ڕەوا.، باک.): کلێنچە.

**کلێس**: چتێکە، کە بنەبڕبووبێ، تیرەی هەمەوەند بنەبڕبووە.

**کڵێسە**: کلیسا، نێوی دێیەکیشە لەناوچەی قەرەداغ. کەڵێشە، بۆکڵێشە.

**کڵێشمان** (زا.): کلێکە بۆ جووانی بەکاربڕێ.

**کڵێشە**: بڕوانە: کلیشە.

**کڵێڵ** (ئەردە.): کلیل.

**کڵێڵە**: کلیلەی بەفر.

**کڵێڵەبەفر**: ڕنووەبەفرێکە هێشتا نەڕووخابێ.

**کڵێڵەبوون** (ئەردە.): دەم چوونەکلیلە.

**کڵێڵ و کۆم** (ئەردە.): کلیل و کولۆم.

**کلێنچە**: کلێنچک، کلکی بزن و هی دووگی مەڕییە، (باک.) کلێژە، (شن.) کلێجە، (کە.) کلنجک، باقل، ئێسقانێکی باریکی گرێ گرێی کورتە بە ژوور قوونی بزن و مەڕ و هەندێ گیانداری ترەوە لەجیاتی کلک.

**کلێنچک**: کلێنچە.

**کڵێنچە**: کلێنچک.

**کلیت** (باک.): سەرۆک، سەروەر، سەردار.

**کلیسا**: کلێسە، دێر، پەرستگای فەلانە، جێگای خواپەرستی و فەلە و دیانانە.

کلیسا

**کلیسە**: کلیسا.

**کڵیسە**: کلیسا.

**کڵیش**: شارای خەلە و خەرمانییە.

**کلیشە**: بنباخەڵ، وێنەی چت، کە بە قەبارە دەربهێنرێ بۆ ئەوەی، کە وێنەی زۆری وەک وی لەسەر قاقەز بە هۆی چاپخانەوە چاپ بکرێ.

**کلیفانک** (باد.): لووتکەی چیا.

**کلیکلی** (باک.): باڵندەیەکە.

**کلیل**: (هەورا.) کرێل، چتێکی زبانەدارە قفل یا کلۆمی پێ دەکرێتەوە، کلیلی کولۆم و ئیتر.

کلیل

**کلیلە** (موک.): شووێنێکی قووڵ و چەکە با بەفری تێدا لوولدا و پڕی کاتەوە و ڕێگای خەڵکی بگری، گێژەنەی بەفری. (سەق.) ڕنووەبەفر. (کە.) شەرنەخێوی، غاردانی وولاخی بەرزەیە بەدەوری خۆیدا.

**کلیلەی مل**: گرێی مل.

**کلیل بەدەست**: کلیلدار، کەسێکی کلیلی شوێنێکی بەدەست بێ.

**کلیلدار**: نۆکەر، کەسێکە کلیلی شووێنێکی بەدەست بێ.

**کلیلدان**: داخستنی دەرک و پەنجەرە و ئیتر بە کلیل.

**کلیل و کۆم**: کلیل و کولۆم.

**کلیل و کولۆم**: کلیل و کۆم.

**کلینجک** (فە.): کلێنچک.

**کم** (زیی.): پێچ، کلاوپێچ، سەرووپێچ.

**کمامخ**: کاماخ.

**کمت** (باک.): قوللە، نووک.

**کمرە**: کەمرە.

**کمز** (کە.): ئەوەیە، کە گووێ و کەنارەکانی تاشرابێ.

**کمک** (باک.): کلاوی شەوێ.

**کمکمە** (باک.): قۆڕی. (ڕەوا.) قومقۆمۆک.

**کمکمە** (باک.): کیژێ، کچێ، لەکاتی بانگ کردنێدا.

**کن** (باک.): کورت. ــ کرن: کورتکردنـەوە. لا، تـەک، تەنیشـت، نـک، گڤک، با، لال، (باک.) جەم، هند، قەد، لایەن، ڕەخ، بال. ــ تو: لای تۆ. ــ بـا: لبـامن، لـەکن مـن. لـە ـــ: لـەلا، لەتـەک، چـەنی، (بـاک.) تەنشتکی.

**کنا** (ئەردە.) کناچە.

**کناچە** (هەورا.) بڕوانە: کناچێ.

**کناچەکێ**: خوشکەلێ.

**کناچلێ چەم** (هەورا.): بەبەلەی چاوی.

**کناچێ** (زەن.، شەبە.، هەورا.): کچ، دۆت، کیژ، کچێکی هێشتا شووی نەکردبێ، ووتەیەکیشە وەکوو ووتەی کچێ.

**کنار**: داری نەبک. *

**کنارە** (کە.): شوورەی خانوو. کەنار.

**کنانەوە**: هەڵنەدان، لەنەشونما کەوتن.

**کنە** (هەورا.): سەرنج. ــ کردن: سەرنجدان، لێکۆڵینـەوە، لـەبنچینـەدا چوونە خووارەوە.

**کن بەرامای** (هەورا.): کۆم دەرهاتن.

**کنج** (جز.): تـەنها بـە مرادخانی دەڵێـن. (باک.) بـێ نووێـژی ژنـان، تێکەوتن. ــ ێ وی هاننە، لبەرکنجایە، بێ نووێژ، تێکەوتووە. (باک.) بـــەرگ، جلـــک، پۆشـــاک. (ئـــەردە.) چـــتی کـــاڵ و کـــرچ.

**کنجر**(باد.): پەڕۆ.

**کنجک** (باک.): پەڕۆیەکە قاپ و کەوچکی پێدەشۆرێ، بوورزوو، بۆزوو، قاپشۆر.

**کنج و کۆڵ**: بڕوانە: کنج.

**کندڕ** (کۆ.): (کە.) کز، کـەندڕ، شریتی باریک یا ئەستوورە. (بابا.) تەختە ساف، جوورە دەزوویەکی باریکە کەندڕی گووشی شەکر و چتی تری ئەستوور.

**کندرە**: دەزوو.

**کندردرک**: (کە.) تەشی.

**کندڕووس** (ڕەوا.، باد.، دەش.): سندان، زلفنج، زلفنجاو، ژەهری مار، قوزەڵقورت، بۆ جنێویەکار دەبرێت.

**کندۆ** (بار.): گوێلکی دووساڵانەی نێرومێیە، پارگوێر.

**کنر**: گووش. (کە.) کەندر.

**کنک** (باک.): قولەبنە، قەڵەوکورت، خڕپن.

**کنگ** (کە.): قوون، قنگ، کوون (سنە.) تن.

**کنگەبان**: قوونەبان. بێ ـــ: بێ قوونەبان، تەمبەڵ.

**کنگر** (هەورا.): کەنگر، قنگر.

**کنگرەکەرانە**: کەرتەشی.

**کنۆرە** (ڕەوا.): (هەورا.) قاڵنگە، دارێکی دوولکی درێژە درک و داڵـی پێ کۆدەکەنەوە و پەرژینی ئەستڕی پێدروستدەکرێ.

**کنووس** (باک.): بەرچاوتەنگ. ــ ی (باک.): بەرچاوتەنگی.

**کنوکۆ** (ئەردە.): گردوکۆش.

**کنێر** (باک.): دوومەڵ، قوونێر. گوڵێکی زەردە، داری مەلحەم.

**کنێرە**: کنێرۆکە، کنێر، گیایەکە گوڵی زەرد و بۆنخۆشـە تا چـووار بسـتان بڵنـد دەبێ گەڵایـەکانی وەهـی سـێوەڕەی دەچـێ، وێنجـەی کێوییـە، هـەر لاسـکەی تـەنها سـێ گـەڵای پێوەیـە و سـەری هـەموو لاسـکەکانی بـەگوڵی زەرد داپۆشراوە، بۆمۆریانە بەنێو چلان وەردەکرێت.

**کنی** (ڕەوا.): قرتماخە، قەتماخە، قرتماغی سەری کەچەڵان.

**کنیست** (باک.): چاوئێشـەیەکە ئاوبکات.

**کنیواڵ** (بان.، هەوشار): کوڕادە، قوڕادە.

**کۆ** (بـاک.): ژیۆنـاکۆ: بـۆ ئـەوەی کـە. (زا.) کـا. پـێروو، کۆمەڵـە ئەستێرەیەکی ناودارە بە نێوەڕاستی ئاسمانـەوە لـەنزیک کۆتـایی هـاویندا پەیدا دەبێ. جوورە نەخۆشییێکە لـە چاوی چارەوێ دەدا ڕەشکێنەکەی سپی هەڵدەگێڕێ پێی نـابینێ چـارەی بـەوجوورە دەکـەن: یـەکێک لـە خورێـنی دەمـی پردەکـات لـە ماست بـەتوندی دەپڕمێنێ بـەناوچاوە ناسـازەکەیدا، تاچـەند ڕۆژان ئـەم کردەوەیـە دووپاتـە و سێپاتە دەکرێتـەوە لـەبـەر ئـەوەی، کەماسـتەکە دەچێتـە نێوچاوییـەوە چـاک دەبێتـەوە. (فـە.) کـرژ، کێـو، زنجیرەی کۆ: زنجیرەی کێو. (باک.) کە: مرۆڤـی کـۆ تـە دیت برایـی مـن بوو: مرۆڤەکەی، کەتۆ دیتت برای من بوو. (هەورا.) کووێ، کووێنـدەرێ. ـــ ملی: بۆکووێ دەچی؟. چە ـــ: لـەکووێ. گرد، (باک.) خڕ، کـووم، تۆپ، برهـاڤ، (هـەورا.) گلـێر. ـــ بوونـەوە: خڕ بوونـەوە، بـەرگهین، بەرهەڤبوون، کۆمەڵ بوون. ــ کردنـەوە: خڕکردنـەوە، زجێف کردن، برهاڤ کرن، بەرهەڤکرن، بـەرگهاندن، کۆمـەڵکردن. (کرما.) قۆپەن، دەغڵێکـی بـەهێزە، کەلـــە نـــاویدا پارچەپارچـــەی گچکـــە، کەجێگاکـــەیان بـــەهێزە تێکدەنـاڵێن و بەرزدەبنـەوە. ــ (باک.) کـە، ئەگـەر، گـەر، دارا ـــ چـووە دیاربەکرێ ئەزیش دچم: ئەگەر دارا چووە دیاربەکرێ منیش دەچم.

**کۆئەندامی هەرس**: کەرەستەی چیکڵدانە.

**کۆبە**: شیرازەی پەرتووکان. (کۆ.، موک.، بابا.، هەورا.) پـەراوێز، ئـەو پارچـە تیلماسـکانەیە دووای نوشـتانەوەی کـەنارەکانی لـەدیوی ژوورەوەی دەدەن، سـاندە.

**کۆبڕ**: شووێنی پڕوچڕ لـە دەغلان.

**کۆبوون**: کۆبوونەوە.

**کۆبوونەوە**: خڕبوونەوە، کۆمەڵ بوون، گردبوونەوە، بەرگهین، بەرهەڤبوون، جڤان، جڤین، (باک.) هێورین، ئێورین.

**کۆپ** (باک.): قوللـە، تەپۆڵکـەی سـەری کێوی. ـــ ی چاڤ: پێڵـووی چاو، (باک.) کۆپک.

**کۆپار** (ئەردە.): کۆپارە، ئەستووی مل.

**کۆپارە**: کۆما گۆشتێکی گەورە و بەرزە بەسەر پشت ملی ووشتر و وولاخـەوە، دووکـی پشـتی ووشـتر. کۆسـپایی و زەوییێکـی بـەرزە.

**کۆپان** (هەورا.، بابا.، باد.، فە.): کورتان، پاڵان. گۆچان.

**کۆپانە** (کە.): ئەو ئەختە توورکەیە، کەبەسەر پشتی بەرخانیەوە دێڵنەوە. (کە.) قیتایی سەرپشتی ووشترانە، دووگی سەرپشتی ووشترانە.

**کۆپاندروو:** کورتاندروو.

**کۆپان تاخن:** شیشێکی سەر دوو فلیقانەیە پووشی پێ لەکورتانی دەتاخنن.

**کۆپاندوور:** کۆپاندروو.

**کۆپان ووراز** (هەورا.): کورتاندروو.

**کۆپانی شووان** (فە.): گۆچانی شوان.

**کۆپەڕ** (هەورا.): کاتی پووشپەڕ.

**کۆپەران:** کۆپەلان.

**کۆپەڵ** (کە.): خڕکە، دەستەبەرد.

**کۆپەلان:** کۆپەران، جەواڵ یا تەلیسێکی پڕلەکایە لەسەر پشتی وولاخانی شەخرەکێش دادەنێن تا پشتیان بریندار نەبێ. ملوانەیەکیشە لە قایشی خڕ و ئەستوور لەملی گاجووتان لەبن نیری تا نیرەکە ملی ئازار نەداو برینداریشی نەکات.

**کۆپەک** (باک.): پێڵووی چاو.

**کۆپلانە** (باک.): سەرەوژێر یا پەرتکردن.

**کۆپیان** (باک.): تێوەچوون، چوونەنێو.

**کۆت:** دارێکی دووپەلە دەخرێتە پێی گامێشەوە تانەڕوات. ڕووت، پەتی، قۆت، کوڵ.کورت،دژی درێژییە. تەنها بۆ سەربەکار دەبرێ: سەرکۆت. دووتەختەی پانی گچکەیە وە بەر کونی مەشکە و هێزە دەدرێت لە دیوی بنەبانی توند دەبەسترێ. (باک.) قوڵلە، قەلات، دژ، قوللەی کێوی. ـــ کرن: گۆرانی بەدەنگی بڵند کوتن. (کە.) چیلکە یا پارچەدارێکە کوندە یا خێگەی پێ پینەدەکرێ و کونەکانی پێدەگیرێ. کۆتی بەندیخانان، پێوەند، پابەند، دەستبەند، (شن.) خەلیلی، سندم، دارفەلاقە، جوورە پێوەندێکە لەدەست و پێ دەکرێ.

**کۆتا:** کورتەباڵا. کورت، قوڵە. ـــ بوون: برانەوە، قەدیان. ـــ کردن: بەسکردن، براندنەوە، بردنەسەر، برینەوە، کۆتایی پێدان، دوایی پێ هێنان.

**کۆتاک** (ئەردە.): مۆڵگای ئاژاڵ، پەچە.

**کۆتاکردن:** بەسکردن، کۆتایی پێدان.*

**کۆتان:** (باد.) کۆڤ، (هەورا.) کەلارە، حەوشێکە دیوارەکانی بەرزێک بڵند و لەدار و پووش دروستدەکرێ، سەربانی نیە لەزستانانداندا ئاژاڵی تێدەکرێ، دیواری تەویلەی ئاژاڵان لەتانۆکیش دروستدەکرێ، بۆ هەموو شوێنێکیش بەکار دەبرێ، کەمەر و ماڵاتی بەشەودا تێدا مۆڵ بدرێ. (موک.) جوورە کەرستەیەکی جووتییە بە چوارکەلان رادەکێشرێت. کەپرێکی نزم و سەر سوواخدراوە میوەی لەسەر ووشک دەکرێتەوە، مشتاخ. (باک.) جێگای دەورەدراوی. ـــ ی (دەر.): هەوارەمەڕ.

**کۆتاوین** (هەورا.): کورت بێن.

**کۆتاوینی** (هەورا.): کورت بینی.

**کۆتاهاتن:** دوایی هاتن، بڕان.

**کۆتاهی:** کۆتایی.

**کۆتایی:** برانەوە، قەدیان، هەرەدوایی، کۆتاهی، دوایی هەموو چتێک، دوایی ساڵ، کۆتایی خەلە و خەرمان. کۆتایی تەمەن. ـــ کردن: هێڤشاندن. درێغی کردن لەکارێکیدا.

**کۆتایی پێهێنان:** دوایی پێهێنان.*

**کۆتایی هاتن:** برانەوە، دوایی هاتن، بڕان، لەبنەهاتن.

**کۆتایی هێنان:** دوایی پێهێنان، قەداندن.

**کۆتە:** کۆڵکەدار، جوورە دارێکی گەورەی بێ بەرە، دارێکی درێژی بە گوڵمێخ لەزەویدا چەقاوی لەلەکراو لەڕاستی هەر لەلەیێکی قوڵفێکی ئاسنی تێدایە پێبەندی تێدەخرێ. کۆتا. ـــ کردن: کۆتایی پێهێنان. (باک.) کەر، کەرکە پەزێک، پارچە مەرێک، مێگەلێکی گچکە.

**کۆتەرە:** پەلەوورێکە باڵی نەمابێ. دارێکی بەرزە گۆشتفرۆشان گۆشتی لەسەر لەتلەت دەکەن، کوتە. پارچەدارێکی خڕی ئالەبارە، بنەدارێکی ئەستووری براوە. سەرەبزووت.

**کۆتەشکێن** (ئەردە.): پارچە ئاسنێکەلەبەردەمی بوخاری دادەنرێ بۆ تەکاندنی بزۆت.

**کۆتەڤر** (باک.): هەنگووین.

**کۆتەک** (ڕەوا.): کوڵکی دەدانی. (باک.) دژواری، سەختی، ئازار، کوتەن. ـــ ی: زەبر، سەخت.

**کۆتەڵ** (باک.): نووشتەوار. قەراخ و کەنار نوشتاندنەوەی جلک و ئیتر. (هەورا.) ئابیدە، پەیکەر، چەمەر، دووای مردنی یەکێکی خۆشەویست، کە جووان یا ئازا یان سووارچاک و جووامێر یان ناوداربووبێ بەبەرگەکەی پشتی ئەسپەکەی دەرازێننەوە و چەکەکانیشی پێوە هەڵدەواسن و ئەوسا پێی هەڵدەڵێن و دەیگێڕن. چوکڵ و چێو، (کە.) کۆزر (بۆ دەغل و دان)، درشتی گوڵەگەنم و جۆ و ئیدیکەیە، کە دووای گێرەو جۆخین هەڵگرتن و هەم دووای لەبێژنگ و سەرەند دانی لەسەرەوەی بێژنگێ دەمێنێتەوە، سەرکۆزرە. کۆمەڵە داروردەختێکی داربەڕوو یا مازووە، کە چڕوپڕبێ، ناوەڵە. پەیکەر. نێ ی ئاش.

**کۆتەڵ:** ناوە بۆ شوێنێک لەبەردەمی دێ ی سووررداش، کە داروددەوەنی زۆرە.

**کۆتەڵ بوون:** گەورەبوونی مندااڵ، منداڵەکە کۆتەڵ بووە: واتە لەخەم ڕەخسیوە.

**کۆتەی** (هەورا.): کەوتن.

**کۆتەی ڕا** (هەورا.): کەوتنەڕێ.

**کۆتەی قەساو:** بنەدارێکە قەساب گۆشتی لەسەر وورد دەکات.

**کۆتەی کەوشدروو:** بنکەدارێکە کەوشدروو کەوشی لەسەر دەدوورێ.

**کۆتەیۆ** (هەورا.): کەوتنەوە.

**کۆتر:** (فە.) کەبووتەر، کەبووتر، (هەورا.) کاواتری، (باک.) بەهیڤ، کەڤۆک، باڵندەیێکە کێوی و کەوی هەیە، بەڵام کێوییەکانیان پتر شین و سپین و بەقەد باڕۆکەیەکی چکۆڵەدەبن.

**کۆترە** (موک.، کۆ.): کۆتەرە، سەری کوڵەکانە، دارێکی پانە لەناوەندی هەسوون و (کۆمانج) ی دەواری دادەنرێ. (ڕۆژ.) ڕەگ و ڕیشەی ئەو دارو دەوەنانەیە، کەلەژێر خاک دەردێنرێن بۆسووتاندن، کیسەڵە.

**کۆترەباریکە:** جوورە کۆترێکە لە کۆتری ئاسایی گچکەتروباریکتر و بۆرە و خاڵێکی لەلای گوێیەتی خووێندنی لەمەی ماڵی ناچێ، (بەرز) ترێنە، (هەو.، خۆ.، شەم.) تفتیلک، (شا.) ترێنکە، (ڕۆژ.، بار.) توویل. قومری.

**کۆترە بەرچیلە:** کۆترەباریکە.

**کۆترە تەقڵەباز:** کۆترێکە لە هەوادا تەقڵەی لێدەدا.

**کۆترە قەلاش** (کۆ.): جوورە کۆترێکی کێوییە.

**کۆترەکێفیلە:** کۆترە، کێویلە.*

**کۆترە کێویلە:** کۆترە گابەل، گابەل، هی شین و سپیان هەیە.

**کۆترە گاپەل:** کۆترێکی زۆر گەورەیە لە لێڕەواراندا دەژی دوو دێخی سپی لەسەر باڵییە.

**کۆترباز:** کەسێکە، کەکۆتر ڕابگرێ. ــــ ی: ڕاگرتنی کۆتران و بەخێوکردنی.

**کۆترخان:** کولین، (باک.) بۆرانخانە، (باد.) لیس، جێگایەکە بۆ لەسەرهەڵنیشتنی کۆتران بەتەختە یا بەچەند پارچەدارێکی لە بڵندی دروستدەکەن.

**کۆتروک** (بار.): فینجانی سەردارتێلانە.

**کۆترهاتن** (ئەردە.): کۆتایی هاتنی چتێکییە.

**کۆتک** (بار.، باد.، باک.): کاسە، کۆجیلە، (ڕۆژ.) تەپسی، (ڕۆژ.، هەورا.) تەشی، کەمۆڵە، کۆتکە. ــ ی ئاش: کەپولە.

**کوتکە:** توتکەسەگ.

**کۆتکە** (ڕۆژ.): ڕەگ و ڕیشەی دارییە. تەشپییەکی گەورە و قووڵی دەم واڵە.

**کۆتن** (زا.): کەوتن، کراندنەوەی گۆشت لە تێسکی بەددان.

**کۆتنای** (هەورا.): کەواندن، خستن.

**کەتی:** کورزی دارین.

**کۆتیلە** (هەورا.): درەختێکی گچکەیە لەبەرکزی بەرزنەبێتەوە.

**کۆتینای:** بڕوانە: کۆتنای.

**کـۆج** (بۆتـا.): (کـۆ.) کۆریـس، ئـاژا لـی بـێ شـاخە، کـوڵ.

**کۆجەڵە:** کاسەی دارینی گچکە. چتێکە لە قوڕ دروستدەکرێ لە وێنەی لالەوێج لەقەدی دارەنەی قایم دەکرێ تا بنێشتەکەی تێ بچێ.

**کۆجیلە:** (گەرد.) شکەو، (کۆ.) قۆدیلە، کوجەلە، کۆجەڵە، کۆتکی ناوێیە لەدارییە.

**کۆچ:** بزن و بەرانی بێ شاخ. ئۆغز، کەل و پەلی کۆچەرییە بە بارەوە. ــ کردن: بارکردن، ڕۆیشتن، گوێزتنەوە، کۆچەلکۆچ، بارکردنی ماڵ لە شوێنێکەوە بۆ جێگای تر. (باک.) قەدی داران، موورەدار. ــ کرن: ڕۆییشتن، بارکردن.

**کۆچاوکۆچ:** گوازتنەوە لەم کۆچەوە بۆ ئەوکۆچ، هەرکی هەر خەریکی چاوکۆچین.

**کۆچای کۆچ:** کۆچاوکۆچ.

**کۆچە** (هەورا.): جوورە هەنجیرێکی ووردی سوورووخڕی زۆر شیرینە.

**کۆچەر:** ڕەوەند، خێڵات، کۆچەری، خاوەند مەڕ و مالات و دەوڵەتن گەرمێن و کوێستانێ دەکەن و ڕەشماڵ نشینن.

**کۆچەرات:** حێلات، خێلات، خێلەسات.

**کۆچەری:** چادرنشینی، چۆڵگەردی، کۆچەبەری کەسێکە نیشتە جێ نەبێ کۆچکەر و گەرمێن و کوێستانێ بکا.

**کۆچەک** (یەز.): مەلا، زانا، کۆچک، شێخ. کوڕێکی جوانە جلی ژنانە لەبەربکا و لەنێو پیاواندا سەمایە بکا.

**کۆچەکاو** (هەو.): جوورە هەنجیرێکە وەک کۆچە، بەلام ئەم زەردە.

**کۆچەکە:** فێستی سەری ژنان.

**کۆچەل** (باک.): بەندەری، دەهەم، کەوە.

**کۆچەڵە** (ڕۆژ.): گەی سمتییە، جووجکەی سمتییە، جمگەی سمتییە. (ئەردە.) چالاو.

**کۆچەڵکۆچ** (کە.): کۆچکردن.

**کۆچبار:** کۆچەر، کۆچکردن.

**کۆچخانە:** شوێنی کۆچکردن. (باک.) دیزەی چکۆڵە.

**کۆچک** (یەز.): مەلا، زانا، شێخ، (یەز.) کۆچەک. (بار.) ئاوورگ، سێکوچکی ئاوری. قۆچک، (زا.) تووتک. (باد.، ئاو.): دیوەخانە. (سوورچی.) کۆچکە.

**کۆچکە:** قۆچکە، قولەقۆچکە، (سوور.) کۆچک، جوورە کلاوێکە سەر و گوێلاکی دادەپۆشێ منداڵ لەسەری دەنێن و لە پشتەوەش کلکی شۆڕدەبێتەوە. لە هەورامانیدا نیشانەی کچانە چونکوو تا مێردی دەکەن لەسەریانە.

**کۆچکردن:** ئۆغرکردن، ڕۆییشتن، بارکردن بەماڵ و منداڵە بۆ شوێنێکی تر. مەبەس لە مردنیشە.

**کۆچڵەبەس:** چەند بەربەستێکە لەبەردەمی تیرەی مەرەزە لەزەوی بەرز و نزمدا بۆ ئەوەی، کە ئاوەکە پۆنگ بخوواتەوە بەتەواوی هەموو مەرەزەکە ئاوبدات، کۆچڵەبەست.

**کۆچڵەبەست:** کۆچڵەبەس.

**کۆچماڵ:** کۆچێکی گشتییە و بەو مەرجەی کەس بەجێ نەمێنێ.

**کۆچمێش** (باک.): خەڵفی مێش هەنگووینییە، کەلەنێو قەڵەشتی بەرداندا دیاردەکات.

**کۆچ و بار:** بار و بارخانە، ماڵی کۆچەری، کە لە ووڵاخ نرابێ، تڵمیت.

**کۆچ و ماڵ:** کۆچ و بار.

**کۆچەهەڵکۆچ** (ئەردە.): کۆچاوکۆچ.

**کۆچی دوایی:** مەبەس لە مردنییە.

**کۆخ:** ــ ی سەگان. (باک.) کولانە، ــ ا مریشکا: کولانەی مریشکان، زنجێکی گچکەیە لە نێوباغ و باخچاندا. لۆدە کا، کە هەمووی سوواخدرابێ. تەویلەی ڕەشمووڵاخان، کۆماج، زنج، قوورچک، قووخەل، کۆژگە، قۆخ، قووخ، کێپل، خانووچکەی باغ و بێستانان، کۆچەران زەوی قووڵ دەکەن و داران بەو جووره (٨) بەسەری دا ڕایەڵدەکەن و گیای بەستراوی باقەباقە لەسەر دادەنێن بۆ مەڕ و ماڵاتانی بەکاردەبەن. خانووچکەیەکی دەمەکییە لە دەرەوەی ئاوایی دا تەنها هاوینان تێیدا دادەنیشن یا میوە و دەواری تێدا پەروەردە دەکەن.

**کۆخا** (هەو.، کە.): کووێخا، کەیخا.

**کۆخاندن:** کوخیاندن، تڵخاندن.

**کۆخە:** قڵخە، کوخک، کوکە، (هەورا.) قۆزە، (زمن.، داودە.) کۆکە، قۆزە، کووپکە، (هەورا.) قوزە، قفە. (باک.) تەپاڵە، شیاکە، ڕیخ.

**کۆخەر** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**کۆخەرەشە**: کۆکەرەشە، (هەورا.) کەرگەقاز، کوخ بۆقە، (هەورا.) خەفەخان، کۆخەیێکی پیسە لە کۆخینێ داخرەخری لەگەرووی دێ.

**کۆخەکۆخ**: قڵخەقڵخ، کۆکەکۆک.

**کۆخ بۆقە** (هەورا.): کۆخەرەشە.

**کۆختە**: قۆختە. ـــ ی ماسی گرتنێیە.

**کۆخک** (باک.): کۆخ، زنج، ژوورێکی گچکە.

**کۆچک** (زا.): کۆخە، تارا.

**کۆخن**: قڵخن، کوخکی کەسێکە زۆر بکۆخێ.

**کۆخوواردنەوە** (ئەردە.): پارێزکردن و سڵەمینەوە لەچتێک.

**کۆخین**: کۆکین، قڵخین، کوخین، کوخیان، کوخین، قۆزین، ققین.

**کۆد** (باک.): بەرمیل، چەلەنگ، پیپ، دەفرێکە تا (٢٥) کیلۆیان دەبات. ـــ چێکەر: چەڵەنگساز، بەرمیلساز. (باک.) قفل. کاسەیێکی گچکەیە شوان شیری تێدا دەدۆشێ.

**کۆدانن**: پێکهێنان، دنەدان، لەسەرخۆبوون.

**کۆڕاندنەوە**: سەرزەنشت کردن. *

**کۆڕاننەوە**: کۆڕاندنەوە. *

**کۆدە**: خورامە، مەڕانە، پارەیەکە لە جیاتی سەرانەی ئاژاڵان وەردەگیرێت، (هەورا.) قۆچان، شاخانە، (کە.) پووشانە، مەکات، پووشانەیێکە، کە خاوەند زەوی لە ئاژاڵداری دەستێنێ.

**کۆدەل** (باک.): تەختەبەردی دەریایی.

**کۆدەڵە**: چیایەکە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕەواندزێ بەلای حاجی ئۆمەراندا.

**کۆدچێکەر**: (؟).

**کۆدک** (باد.): کەشکەژنۆ، بەردێکە سەنگی دوو کیلۆیە. (باک.) تفلی گچکە.

**کۆدۆ** (باک.): ژوورک. کێوێکی بڵندە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی ڕەواندزێوە بەلای سنووری کوردستانێوە ڕێی دە کاتژمێران لە ڕەواندزێ دوورە، (کۆچەران) سەرسوول.

**کۆدیلە** (هەو.): کووپەڵەی ڕۆنی. (هەو.) جەڕڕە یا کەدینەیەکە سەرەکەی نەمابێ.

**کۆر**: کوێر. (ڕەوا.) کۆڵ، جلک شووشتن.

**کۆڕ** (هەو.): کوێر. ئەنجومەن، کۆمەڵی گیاندار. مەیدان، گۆڕەپان. ئاڵقە.

**کۆڕاڤ** (مەر.): پارچە. ـــ حەرد: پارچەی زەوی.

**کۆراڤ** (باد.): قوڕاو، ئاوی شلوێ. کوێراو، کەندێکە ئاوی ووشک بووبێ.

**کۆڕان**: حیلە، حیلاندنی ئەسپ.

**کۆڕانەوە**: کوڕووزانەوە.

**کۆڕاندن**: حیلاندنی ئەسپ، پرماندن.

**کۆڕاندنەوە**: سەرزەنشکردنی کەسێکی چەند جاران.

**کۆڕاننەوە**: کۆڕاندنەوە.

**کۆراو**: کوێراو، کۆراڤ، کوێرەکانی.

**کۆرەبەشک**: جوورێکە لە مشکە کێوی.

**کۆرایی**: کوێرایی. چاو سپی بوون: ـــ داهاتن: کوێربوون، چاو تاریک بوون.

**کۆرە**: کوێر.

**کۆڕە**: پرمەی ئەسپە لەکاتی غوبایی دا، دەنگی بەرزی گریانی بەکوڵ.

**کۆرەبزە** (ڕەوا.): جووانووە ماینێکی پشتە نەکراوە واتە زین نەکراوە و کەس سوواری نەبووبێ و تەمەنی دووساڵانە بێ بەرانبەری دووبڕییە، کە جووانووئەسپە.

**کۆرەکە**: کۆرکۆرەی ئاش، نێی ئاش، ناوی بە کۆرەکەی ئاشی دایە.

**کۆرەکۆر**: کۆرەی یەک لە دووای یەکتری.

**کۆرەلاش**: گیایەکی بەهارییە لە شنگ دەچێ، بەڵام ئەم گەڵای پانترە.

**کۆرەمار**: کوێرەمار.

**کۆرەمشک**: مشکەکوێرە.

**کۆرەوەری**: کوێرەوەری.

**کۆرە وەبیاب**: قۆڵە ڕەبیاب.

**کۆرپە**: ساوای گیانلەبەر و سەوزایی. داری هەڵپاچراوە، کە تازە لق و پۆپی دەرکردبێتەوە؛ نزاری دارا بەشێکی کۆرپەیە و بەشێکی برەیە.

**کۆرپەیی**: ساوایی.

**کۆرپەڵە**: منداڵێکە لە نێو مەلۆتکە یا منداڵداندا بێ.

**کۆرپێگرتن**: سەرنانە سەریەکێک و بەزەم پێ گرتنی.

**کۆرت** (باک.): قۆرت، چاڵ، قووڵکە.

**کۆرتال** (باک.): کەند، قۆرت، قووڵکە، خڕ، شوێنێکە سێلاو دریبێتی.

**کۆرتک** (باک.): قووڵکە، چاڵ. ـــ چاڤ: قوڵکەی چاو.

**کۆردەرە**: شیوێکە هەمیشە ئاوی نەبێ.

**کۆردەر**: ناودۆڵ و دەرەیەکە، کە دەرنەچی.

**کۆردەرزی** (باک.): دەرزیلە.

**کۆردوندان**: وەجاخ کوێر، بێ منداڵ.

**کۆرس** (باک.): ڕەق، قاییم.

**کۆرس** (زا.): جۆلا.

**کۆرسکەر** (باک.): جۆلا، تەوونگەر.

**کۆرشک** (باک.): کەروێشک.

**کۆرک** (بار.): کۆخە.

**کورک** (باک.): کوێروو، ژەنگی دەغڵی.

**کۆرکۆرە** (باد.): کۆلارە، داڵ، (زا.) کۆلارەمار.

**کۆرکۆری**: کارکاڕۆک.

**کۆرگە**: جێگای کۆبوونەوەی چەندکەسێک.

**کۆرمیچەک** (باک.): چین و لۆچی ڕوو، گرژی ڕوو.

**کۆرنگان** (باک.): گیایەکە.

**کۆروکانی**: کوێری، بێ چاوی. ئاژاڵی گوێ چکۆڵە، (هەورا.) کەرە. (خۆ.) کۆڵ و کانی، جلک و لەش شوشتن. ـــ کردن: جل شوشتن.

**کورنوش**: بەشێوازەوە چەمانەوە و نیوچاوان لەسەرزەوی دانان، کوڕنۆش.

**کۆری**: کوێری، بێ چاوی. ئاژا ڵی گوێ چکۆڵە، (هەورا.) کەرە.

**کۆڕێ** (ڕەوا.): کۆڵ، جلشوشتن.

**کۆڕیان** (ڕۆژ.): ئاودڕ ئەو جێگەیە ئاودڕی دابێ وەکوو نیمچە کەندەڵانی لێ کردبێ.

**کۆرەدار**: کۆمەڵەدارێکی چڕی بەیەکاچووە.*

**کورەک** (ئەردە.): کورۆک: زمانەی چت.

**کۆرەکە**: کۆرکەرەی ئاش، نیێی ئاش، ئاوێ بە کۆرەکەی ئاشیدا چێ.

**کۆرەلاش**: گیایەکی بەهارییە لە شنگ دەچێ، بەڵام ئەم گەڵای پانترە.

**کورپە**: بۆسە، خۆشاردنەوە.

**کورپە**: دواکەوتوو، ساڵێکی باران دواکەوێ و درەنگ ببارێ بەهاری ساردبێ پێی دەڵێن ئیمساڵ شواڵەی کورپەییە. بەبە، کۆرپەڵە، بەبەڵە، منداڵی شلک و ساوا.

**کۆریس**: بزنی بێ شاخ و کوڵ.

**کۆری**: کوێرایی، چاوسپی بوون. کوێری.

**کۆرایی داهاتن**: کوێربوون، چاوتاریک بوون.

**کۆرە**: هاوار، فیغان.

**کۆرەپان**: کۆپەران.

**کۆرەکوا**: حیلەحیل، دەنگی ئەسپییە لەکاتی سمکۆڵێدا و یا لە کاتێکیدا، کە خاوەندەکەی سوواری بێ؛ کۆلارە، دا ڵ.

**کۆرپەڵە**: کۆرپە، بەبە، بەبەڵە.

**کۆریان**: کۆران.

**کۆرگ** (ئەردە.): کوێرووی دەغڵی.

**کۆڕیانەوە**: کۆرانەوە.

**کۆرزیوان**: گیایەکە سێ بست بڵند دەبێ بەگەڵایان داپۆشراوە گەڵایەکەی وە زمانی ماڵاتی دەچێ و تووکن و تۆزاوییە گوڵی سپی و شین دەردەکات و لە نێو گوڵەکانیدا زیوانی تێدایە.

**کۆریت**: کۆڵیت، خانووچکەی هاوینانە. کولانەی مریشک.

**کۆڕی دڵداران**: مەیدانی دڵداران.

**کۆڕی زانیاری کورد**: ئەنجومەنی زانیاری کورد.

**کۆرێس** (ڕەوا.): بزن و نێری بێ قۆچ و بێ شاخ یا شاخ شکاوە، (هەورا.) کۆڵ، (کە.) کۆلیس. (خۆ.) مەڕ و کاوڕ یا بەرخێکە دەم و چاوی سپی بێ.

**کۆریشک**: لۆچی کاڵاو هەمووچتێکی تر.

**کۆرین** (باک.): بۆڕاندنی وڵاخانە.

**کۆز** (باک.): پۆلوو. کۆزی بەرخان. شوێنێکە بەرخۆڵە و کاری تێدەکرێ، کە تازەبوون و شلکن. (هەورا.) کۆزک، تەویلەی هاوینی کار و بەرخ و بزنانە لە دەرەوە، پاوان. زۆورێکیشە لە تانۆک دروستەکرێ بۆ کار و بەرخان، پەچە. هەوارگە، لەوەڕگە.

**کۆزانە** (زا.): جوورە ترێیەکی گلوگەورەی خڕە.

**کۆزانین**: کۆڕی زانیاری.

**کۆزە**: جێ مۆڵگەی کار و بەرخانە. (کە.) کەسێکە سپیاتی ڕیشی لەڕەشی پتربێ.

**کۆزەرە**: ئەوپارچە گوڵەگەنم و جۆیانە و ئیترە، کە دووای گێرە یا دابێژتنی بەسەر بێژنگیدا مابێتەوە، واتە ئەو دەنکانەیە، کە لەناوکیفی خۆیاندا نەهاتبنە دەرەوە.

**کۆزەرەڕیشە**: یەکێکە ڕیشێکی بۆزی هەڵپرووزاوی ببێ.

**کۆزەسپیندار**: چنارستان، دارستانێکە هەمووی چناربێ.

**کۆزەکردن**: سارایان لەکۆزێدا کۆکردنەوە.

**کۆزیە**: کۆسپە، لەسەر ڕێگای چیاو دەشت و ئیدیکەدا بەرد یا هەوراز و کەنداڵێکە ڕێگا بگرێ یا لەنێو ڕێگایەدا بێت.

**کۆزچک** (باک.): جێگایەکی گچکەیە بۆ خۆ تێداشاردنەوە.

**کۆزر**: کۆزەر، کۆتەڵ، گیایەکی گێرەکراو و ووشککراوەیە و لەکادێنیی دەکەن پێی دەڵێن.

**کۆزرو بەربخان**: برێتییە لە لێدانی یەکێکی ئێگجار زۆر.

**کۆزک** (باک.): کۆزی ئاژاڵان.

**کۆزکردن**: چەند وولاخێکی یا تاکێکی بە گوریسی درێژ بەستنەوە بۆ لەوەڕێ، (ڕەوا.) ڕاتەوراندن.

**کۆزلاخ** (باک.): کۆخک، خانووچکە، کۆخ، خانووی گچکە و نزم.

**کۆزلوک** (زاخ.): تەرزەی وورد، (موک.) تەرزەڵووکە، گلێرە، (هەورا.) گژنیژە.

**کۆزی** (باک.): گۆشە، کەلێن.

**کۆزمان**: دەستە زانایەکی پسپۆری زمانەوانییە، کە لە ووتەی زمانێک بکۆڵنەوە.

**کوزگە** (کۆ.): (کۆ.) دزکۆزکە، جێگای خۆلێشاردنەوەی دزانە یا هی کەل و پەلی دزیارییە. چاوە خانوویێکی پەرپووتە لەدەرەوە.

**کۆزن** (باک.): کرۆژتن.

**کۆزی** (باک.): گۆشە، قولینچک.

**کۆس**: بەخت، چارەنووس. ـــ کەوتن: مەردوو لێ مەردن. (ئەردە.) کۆست، کۆسپایی.

**کۆسار**: کۆپارە، کێووستان، کوێستان، شوێنێکە، کە شاخ و داخی زۆربێ.

**کۆساران**: هاوینەوار، کوێستان، کۆساڵ.

**کۆساڵ**: کۆسار، کوێستان.

**کۆسە**: کەسێکە تووکی لە ڕیش و سمێڵی نەهاتبێ یا ڕیشی زۆر تەنک بێ، (باک.) بەرکووسەج. (باک.) دەغڵی بێ بژ. جوورە ماسییەکیشە.

**کۆسەبەبە** (هەو.): بووکەبەبارانە، کۆستەوەری.

**کۆسەر** (باک.): دیوار، میچ.

**کۆسەرە:** مرازێکی دارتاشییە.

**کۆسەک:** کۆستەک.

**کۆسەمووی** (کە.): کۆسەبەبە، بووکەبەبارانە.

**کۆسپ:** بەرزایی کەم لە زەوی، قورت و کارەساتی ڕۆژگار.

**کۆسپایی:** کۆسپ.

**کۆسپە:** تەمباز، کەمباز، ژوورک، کەنداڵ، هەوراز، بڵندایی یا بەردێکە ڕێگای گرتبێ یا ڕووداوێکە، کە پەکی کاروبارو مەبەستێک بخات، بەرهەڵست، لاست، کۆسپایی.

**کۆست:** کۆس، بەخت، چارە، بەڵای گەورە.

**کۆستە:** کۆسە، کەسێکە مووی ڕیشی نەبێ یا زۆر تەنک بێ. ناوی دوودێی لە یەکتری نزیکن لە ڕۆژاوای سلێمانی.

**کۆستەبووکە:** (کە.، هەورا.) کۆسەمەوی، (هەو.) کۆسەبەبە، بووکەبەبارانە.

**کۆستەک** (کە.): گوریسێکە گوێدرێژی پێ پەیوەند دەکرێ. (باک.) هۆ، نێوبژێکار، قولفەیێکی چەرمینە بە کێلاٚتی خەنجەرەوە لە مشتووەکەی هەڵدەکێشرێ تا نەیەتە دەرێ.

**کۆستەکۆست:** برێتییە لە چاوڕاوکردنی چەند کەسێکی لەگەڵ یەکێکی بۆ دەست برین و هەڵخەڵەتاندنی.

**کۆستەکی** (باک.): نێوبژێکاری.

**کۆستەمووی:** کۆسەمەوی، کۆسەبەبە، بووکەبەبارانە،ساڵێکی کە ووشکە ساڵ بێ و لە بەهارێدا بێ بارانە بێ دووکەس یەکێکیان ڕووی خۆی ڕەشدەکات و ئەویتریش جلکی ژنانە لەبەردەکات دەستی یەکتری دەگرن ماڵەوماڵ دەگەڕێن ئاویان بۆ نەخشەی بارانە پێدادەکەن.

**کۆسکەفتن** (ئەردە.): کۆستکەوتن.

**کۆستکەوتن:** تووشی نسکۆو ڕووشەیێکی گەورەهاتن، بەخت وەرگەڕان، لێقەومان، خۆشەویست لێ مردن.

**کۆستکەوتوو:** بەخت وەرگەڕاو، دڵسووتاو.

**کۆستەک** (کە.): گوریسێکە گوێدرێژی پێ پەیوەند دەکرێ. (باک.) نێوبژێکار.

**کۆسی** (باک.): قوم. ـ کرن: قومکردن.

**کۆش:** پاشوڵ، دامنە، داوێن. ماوەی بەرو وورگ و ڕانیی مەردومە لەکاتی دانیشتنێدا.

**کۆشان:** کۆشین، تێکۆشین، کۆشش.

**کۆشە:** کۆشین، تێکۆشین.

**کۆشەر:** کۆشیار، هەوڵدەر، تێکۆشەر.

**کۆشەلان** (ئەردە.): کۆگایەک لەتەپاڵەیە ناوەکەی پڕدەکرێ لە پووش و پەلاش بۆ سووتاندنی.

**کۆشەوە:** هەوڵدان، کۆشش، تەقەلا، خەبات، شەرک. ـ کردن: تەقەلادان، تێکۆشین.

**کۆشش:** هەوڵ، تەقەلا، خەبات. شانەی تەونی. ـ کردن: هەوڵدان، تەلاشکردن بۆچتێک.

**کۆشک** (هەورا.): سەرا، تالار، تەلار، باڵەخانە، سەراپەردە، تاق، (دەر.) بانهەڵبان، خانووی بەرز و خۆش. (باک.) کوولەکەی ووشک. (زا.) کڵێنەی ئاو خوواردنەوە.

**کۆشکار** (باک.): کەوشدروو، پینەچی. (باک.) ـ ی: کەوشدروێتی، پینەچێتی.

**کۆشکە** (زا.): جوورە هەرمێیەکە، نێوی دێیەکیشە لەبۆتان.

**کۆشکەلان:** قەلاخدان، تەپاڵدان. سەرانگۆلک.*

**کۆشیار:** تێکۆشەر، هەوڵدەر.

**کۆشین:** کۆشان، تێکۆشین، هەوڵدان، تەقەلادان، خەباتکردن، زۆرتێکۆشین: حەشرکردن.

**کۆف** (باک.): ئەو ئەستوورایییە، کە لە منداڵییەوە بەسەر پشتی کووڕانەوە دەبێ، کووڕ، کۆم.

**کۆفک** (دزە.، شوا.): ڕەحەتی. گولینگی کلاوانیشە.

**کۆفی:** سەروپێچی ژنانە، کۆڤیک، پێچ، جوورە گرێیەکیشە ژنانی کوردستانی باکوور لە ڕاستی نێوچاوانیان دەیدەن لە پێچی سەریان بۆ جووانی.

**کۆڤ:** کۆتان، تەویلەی ئاژاڵان، غار، ئەشکەوت.

**کۆڤار:** گوڤار، بلاوکراوە، یا ڕۆژنامەی هەفتانە، مانگانە، یا وەرزانەیە.*

**کۆڤان** (زا.): برین. (باک.) ئاهەکێشان.

**کۆڤانا** (باک.): بێدادی و جەورێکە لە کەسێکی کرابێ پاش ماوەیێکی وەبیری بێتەوە هەوڵ بۆ تۆڵە ئەستاندنەوەی بدات.

**کۆڤاندار** (زا.): بریندار. ـ ی: برینداری.

**کۆڤک:** ڕەحەتی.

**کۆڤنگ** (زا.): (باد.) کەڕەکیفە، کەڕوو.

**کۆڤی** (باک.): کێوی.

**کۆڤیک** (یەز.): کۆفی، سەروپۆتراکی ژنانە. (باک.) نرخدار، بەهادار.

**کۆک:** شەلاڵ، (موک.) تەریب، لەخاکی باباندا بەدروومانێکی دەڵێن، کە بەدەستدەکرێ و دووایە بە ماکینە. پۆشتە، بۆشناغ، پەرداخ. جووان، دەلال، چتی سازی لەبار. دەوڵەمەند. (هەکا.، کە.، باد.) ڕەگ و ڕیشە، بنچینە. چتی سازولەبار؛ چاپخانەکە زۆر کۆکە. ڕەگ و ڕیشە. (زا.) پەڵپ.

**کۆکان:** شریت یا گوریسێکە چەند ئاڵقەیەکی تێخراوە لەملی کار و بەرخان دەکرێت، ئەشکێل، سەمەندۆک.

**کۆکە** (ڕۆژ.، زەن.، کە.، گۆرا.، دا.): کۆخە. دەنگێکە لە گەرووی گیاندارەوە دێتە دەرێ بەتەکان بە هۆی خورووبەکەوە، کە لە گەروویدا پەیدا دەبێ، نێوی دێیەکیە لە موکریانێ.

**کۆکەڕەشە:** کۆخەڕەشە، جوورە کۆخەیەکە، کە بە منداڵ بگا دەنگی وەک کەڵەشێری لێدێ.

**کۆکەکۆک:** کۆخەکۆخی یەک لە دووای یەکتری.

**کۆکەن:** ئاڵف برین، گزرەخستن.

**کۆکەنار:** بەری گیای خاشخاشییە تێکوڵی خاشخاشی بە هاڕراوی لەگەڵ شەکری دەدرێ بە منداڵی کەم خەو تا خەوی لێ بکەوێ.

**کۆکردن:** کۆکردنەوە. سڵەمێنەوە.

**کۆکردنەوە:** داوەرووکاندن و کۆمەڵەکردن و گردکردنەوەی چتی بڵاو، برهاڤکرن، بەرهەڤکرن، ڤەهەواندن، (باک.) ڤەیدان، دان بەرهەڤ، زجێف کردن، بەڕگهاندن، گردکردنەوە، خڕکردنەوە وە کۆکردن. ـــ ی گژ و گوڵ و گیا و مێوە: چنین.

**کۆک کردن:** قورمیش کردنی کاتژمێر، پۆشتەکردن، سازکردن.

**کۆکگرتن:** پەڵپ گرتن، شەلال کردن، تەقەڵ لە کالادان بە درشت بۆ ڕێک وەستانی.

**کۆکلاخ (هەورا.):** چەقە، جوورە بنیشتێکە.

**کۆکلاش:** گیایەکی کوێستانییە لاسکەکەی بریندار دەکرێ چتێک دەردەدا وەکوو بنیشت دەجوورێ، کۆکلاشک.

**کۆکلاشک:** کۆکلاش.

**کۆکم (باک.):** کۆن، ئەنتیکە.

**کۆکمانە (ئەردە.):** زامێکە لە مەلاشوودا پەیدا دەبێ.

**کۆکۆ:** کۆمەڵ کۆمەڵ. کووکی.

**کۆکی:** ئاشتی یارێکی، ڕێکیەتی، تەبایی. نا ـــ : دووبەرەکی، دووبەندی. پۆشتەیی، کۆک و ناسازی. جووانی. دەوڵەمەندی. (باک.) پەپوولە.

**کۆکین:** کۆخین، قفین.

**کۆگا:** کۆمەڵێکی گەورەیە لە هەمووچتێکی، دووکانێکە هەمووجوورە چتێکی لێ دانرابێ. کۆگە، کۆڕ، ئەنجومەن. ـــ ی چتی: کومەڵە، کۆما، ئەنبار، ئەمبار (عەنبار).

**کۆگابازی (ئەردە.):** جوورە یارییەکە چتێکی لەژێر خۆڵیدا دەشارنەوە هەر کەسێکی دۆزیەوە دەیبا بۆ خۆی.

**کۆگادان (ئەردە.):** کۆکردنەوەی چت و کردنی بە کۆگا.

**کۆگە:** (هەکا.) ڕوونشتاخ، کۆگا، دیوان، ئەنجومەن، جێگایە چت یا گیان لەبەری زۆر لێ کۆبێتەوە. (هەورا.) کووێ؟، بۆکووێ؟.

**کۆگەڕەشە:** کۆخەڕەشە، (هەورا.) کەرگەقاز.

**کۆگەوان:** سەرپەرشتی کۆگا.

**کۆڵ:** گیایەکی کوێستانییە گەڵای درێژکۆڵەیە بنەکەی سوورە دەکرێتە کەلانە. (هەو.) پشتە، پشتی، (خۆ.، ڕەوا.) تل، تێلەکە، تەلاش، گوورز، (دەر.) تیلە، چتێکە ئادەمیزاد بتوانێ بەپشتی هەڵیگری. لە ـــ بوونەوە: ڕزگار و ئاسوودەبوون، لە ئێخەبوونەوە. لە ـــ کردن: چت یا گیان لەبەر بە پشت هەڵگرتن. لە ـــ کردنەوە: کۆتایی پێدان، خۆڕزگارکردن. ـــ خستن: کۆڵ دانان. سست، دەستەووستان، تەپ، بێدەستەلات، خاو. جاش، جاشک، جاشەکەر. نەبڕ، کول، هەموو جوورە پاچ و بیوور و ئیتر، کە زۆر کاری پێکرا ـــ دەبێ، کول و نەبڕ دەبێ. دەست یا پەنجە قرتاو، گیان لەبەرێکە دەستی یا پێی یا هەردووکیان کۆڵ بێ، (کە.) کوتمە (بۆ دەست و پێ)، (ڕۆژ.) پێکۆل، پاکوور. کۆریس، بزنی بێ شاخ، گیان لەبەری بێ شاخ. (هەورا.) قەم، تەبەکی هەویری. جلشوشتن، شیو، (کە.) کوڵ. (ئەردە.) هاڵ، ئەشکەوت. (زا.) دۆڵیانەی ئاشە، کە دانەوێڵەی تێدەکرێ، کە ووردەووردە بچێتە ناو چەرەخۆڕەوە. (باک.) بێ شاخ، کۆچ، کۆریس، کۆل، کۆلیس، شاخ کورت، شاخ شکاو. (باک.) ڕووت، ڕووت و قووت، کۆت. (کە.) جۆگەیەکە وەکوو ئاخوڕ دروست دەکرێ لە قسڵ و گێچ یا لە تەنەکە لەو ئاواییانەی، کە ئاویان نییە ئاوی تێدا دەدەن بە مالات و وولاخ و ئاژالان.

**کۆل (باک.):** سەکۆ، دووکانۆکە کووڤ. (باک.، دهۆ.) ئاخوڕ. (هەو.، خۆ.، زرا.) ئەندازەیێکی پێوانێیە پڕ بەتەنەکەیەکی، (دەر.) کۆتک، (ماوەت.) جامەڕبە، دوو ـــ: قەسناخێکییە.

**کۆلار (باد.):** کلاو.

**کۆلارە:** باڵندەیێکە، کورکور، کۆلارەمار، باڵندەیێکی گۆشتخۆری زیاندارە وە داڵی دەچێ. (کۆ.، موک.) بادەوە، منداڵان جوورە چتێکی لە قاقەزی ڕەنگا و ڕەنگ دروستدەکەن و هەڵیدەدەن بە حەوادا، بەدەزوو دەگیرێ.

**کۆلارەمار(زا.):** کۆلارە، (باد.) قرغۆ، کورکورە، داڵ.

**کۆڵان:** کووچە، کووە، لکێکە لە گەڕەکێکی. کۆڵین، هەڵکۆڵین، هەڵقەندن، کەلیان.

**کۆلانە:** وەکوو کەۆلان، وەکوو بەندان، بەندەیانە، وەکوو نۆکەران، بەندەوار. بەخششی کۆلە و نۆکەران.

**کۆڵاندن:** هەڵکۆڵین، هەڵقەندن.

**کۆڵانکوت:** زۆر گەڕۆک.

**کۆلاو:** هەنگامە، کارەسات، ڕووداو، خەم و پەرۆشێکی زۆرگەورە، ڤچان، پێشهاتن.

**کۆلاو:** کەلەبەر.

**کۆلە (ڕەوا.، هەو.، کە.):** بەندە، بەنی، خولام، نۆکەر، کۆیلە.

**کۆڵە:** شووتی گچکە، بەچکەی گیاندار، کەر. شێری گچکە: شێرکۆڵە. (کە.) کاڵەکی نەگەییشتوو، کاڵک. شانازی. ـــ کردن: شانازی کردن.

**کۆڵەبار (ئەردە.):** کۆڵەکەیەکە درابێتە بەر لقێک، کەبەری زۆر گرتبێ تانەشکێتەوە.

**کۆڵەبەس(هەورا.):** زڕکوڕ. منداڵێکە، کە زڕدایکی هەر لە کۆڵی کات، کە پێی بڵێن بۆ چی هەر بەکۆڵتەوەیە ژنەکەش بڵێ: تا نەی بینم، گۆیا زڕدایکێک هەمیشە زڕکوڕی خۆی لە کۆڵ دەکرد لێیان پرسی ئەوە هێندەت خۆشدەوێ بۆیە وا هەمیشە لە کۆڵت کردووە؟ کوتی خووا دەیزانی زۆرم ناخۆشدەوێ دەمەوێ چارەی نەبینم.

**کۆڵەبەست:** کۆڵەبەس.

**کۆڵەبزە:** کۆڕەبژ، جووانووە ماینێکە دوو بەهاری دیتبێ.

**کۆڵەبژە (کۆ.):** کاریلەی ساوای یەکمانگییە.

**کۆڵەبی:** درەختی کووررووز، نێوی دوو دێیانیشە لە ناوچەی سەنگاو و تانجەڕۆ.

**کۆڵەدار (خۆ.):** کۆلکەدار.

**کۆڵەمر:** هەڵدڕ، هەڵکۆڵ. کەسێکە باش لەچت بکۆڵێتەوە.

**کۆڵەمزێڕینە (هەورا.):** کۆلکەمزێڕنە.

**کۆڵەسی:** دارێکی ئەستووری کلۆرە، کە هەنگ شانەی خۆی تێدا هەڵبەستێ.

**کۆڵەسی:** مێیەکە، کە لە تەمامی تێپەڕبێ و قەدیشی ئەستوور بووبێ.

**کۆڵەکە:** ستوون، ئەستووندە، هەستوون، (باک.): پاژەر. ـــ ی سەر دوو فلیقانە: دووگووێ، دووگێ، هاچە. پردێکە کوللە بەرێچکە بەسەر چۆم و زێیاندا دروستی دەکەن و بەسەریدا دەپەڕنەوە.

**کۆڵەکەجەرە:** دارێکە دەدرێتە بەر چەرخی سەربیر بۆ ئەوەی، کە نەخولێتەوە.

**کۆڵەکەی پشتی:** کاریتەی پشتی.

**کۆڵەکەزێڕینە:** کۆڵکەزێڕینە.

**کۆڵەکەی سینگ:** ئەو ستوونەیە، کە ئێسکەکانی سینگ و پەراسووی پێوەیە.

**کۆڵەکێ** (هەورا.): کۆڵەکە، ئەستووندە.

**کۆڵەوار:** پەرێشان، فەلەکزەدە، چارەڕەش، لێقەوماو، برێندار. ـــ ی: پەرێشانی، چارەڕەشی، لێقەوماوی.

**کۆڵەوانە:** کۆڵوانە.

**کۆڵەوەژ:** کۆڵەوروژ، تەندوور شێوێن، (دەر.) دارتەندوور، بەراگر، دارێکی باریکی درێژە ئاگری تەندووری پێخۆشدەکرێ و تێکوەردەدرێ.

**کۆڵەوەس** (جا.): زەرمندا ڵ (کوڕ یا کچ)، لەنێوانی ژن و مێردێکیدا ئەگەر هی ژنەکەی لە مێردێکی ترە، خۆ کە هی مێردەکەبێ لە ژنێکی ترە. (کرما.) گەفێکە لە پێش پەڵەیدا چاندرابێ و پنجی داکوتابێ، (هەورا.) کۆڵەبەس، ڕەپستە.

**کۆڵەووژ:** کۆڵەوەژ، تەنوورشێوین، دارێکە تەندووری پێ تێک وەردەدرێ.

**کۆڵەوێژ:** هەڵبەستی لەنگی نارێک.

**کۆڵەیی:** بەندەیی، بەندەگەری.

**کۆڵەییتی:** بەندەییتی، بەندەگەرێتی.

**کۆڵبەند** (باد.): پەرستگا.

**کۆڵبەند:** کۆڵوانە.

**کۆڵبیدان:** بەزاندن.

**کۆڵدان:** بەزین.

**کۆڵدەر:** بەزێن، چیرە، کۆڵ نەدەر، نەبەز، خۆگر.

**کۆڵدر** (باد.): پەرستەر، هەرێس.

**کۆڵران:** هەڵکۆڵران، هەڵدران.

**کۆڵزووانە** (کە.): زمانەگا، گیایەکی بەهاری و درووداو و زبرە.

**کۆڵک** (بابا.): چتی بێ کەڵک، ددانی بنرزیو. نیشانە، مەزرەقێکی بێ کەڵکە مەزرەقی بەسەردا دەکوترێ. کۆتەرەداری ڕزیو. کۆلکەدار و ددان و مێوی و نیتر، کۆڵە، (هەورا.) کۆتەرە. ـــ ی ددانی: کۆتەک. مەرزەقێکە لەگەمەدا دادەکرێ.

**کۆڵکنی** (خۆ.): جلک شوشتن لەسەر کانی و جۆگان.

**کۆڵکە:** ناتەواو، نیمچە، کۆڵکە. داری ئەستوور.

**کۆڵکە خووێندەوار:** نیڤ خوێندی.

**کۆڵکەدار:** کۆتەرە، کۆتە، کۆڵە.

**کۆڵکەر:** جلشۆر.

**کۆڵکەزێڕینە:** (باک.) تیرەژە، شەوبەندەرۆژ، (سووروداش) پەلکەزێڕینە، (کە.) ئەستوونەزێڕینە، کەسک و سۆر، پەلکەرەنگینە، (دەر.) زەرد و سوویر، (زەن.) زەرد و سوور. کۆڵکە زێڕینە (کرما.) کەوانی ڕۆستەم.

**کۆڵکەمەلا:** نیمچە مەلا.

**کۆڵکەمیرزا:** نیمچە میرزا.

**کۆڵکردن:** کولکردن. کردنە کۆڵی چت.

**کۆڵگە:** جێی حەسانەوە و پشوودانی چەند ڕاوچییەکە.

**کۆڵگیر:** کەسێکە بە کۆڵ چت بگێڕێ بۆ فرۆشتن.

**کۆڵکێش:** پشتی کێش، تێلەکەکێش. ـــ ی: پشتی کێشی، تێلەکەکێشی.

**کۆڵمک** (موک.): (هەو.) نێک، قوڵسان، کوولێمەک، کوڵۆک.

**کۆڵنەدەر:** نەبەز، خۆگر.

**کۆڵنج** (هەورا.): قۆڵنج.

**کۆڵنجان:** گیایەکی گەرمە بە کوتراوی لەسەر جێگای ئەندامی یەکێک دادەنرێ، کە تووشی ڕەقێنەی بووبێ.

**کۆڵنجە:** تووی نەگەییو.

**کۆڵنجکە:** قۆڵنجکە.

**کۆڵنجکردن:** ئازار پەرینە ناوشان و مل بەهۆی سەرماوە.

**کۆڵنجگا** (ئەردە.): ناوشان.

**کۆڵندەر** (باک.): گیشەی داران. (زا.) کوولەکە.

**کۆڵۆزبانە** (هەورا.): گیایەکی بەهارییە گوڵێکی زەردی هەیە بە کولاوی بۆ ژانەزگ دەخورێ.

**کولۆز** (زا.): کلاوێکە، کە لە خوری دروستدەکرێ.

**کۆڵۆس** (باک.): کلاوی درێژی لبادی، کۆم، زۆم.

**کۆڵۆوەژ:** کۆلۆورەژێن، (بابا.) دارتەندوور. ـــ تێوەردان: تێوەژاندن.

**کۆڵوو:** نانێک یا پارچە نانێکە کەوتبێتە ناو تەندوورەوە لۆچ بووبێ و هەڵپرووزابێ. (هەو.) پەڵۆشە، بنکی گیای تاڵووە لە شوێنێکی، کە داری کەم بێ دەکرێتە سووتەمەنی. ـــ ی تەندوورێ: کووتە.

**کۆڵوانە:** شاڵینە، (بابا.) چارۆکە، (هەورا.) چارەکە، بەرانپیل، (دزە.) بەرامپیل، بەراپیل، (کۆ.) چارەگەبووزینە. (کەل.) ماشتە، پارچە تەنراوێکی چووارسووچە ژنان لەسەر جل و بەرگیانەوە لە کۆڵیان دەکەن.

**کۆڵهەڵگر:** داگرتەک، حەمباڵ.

**کۆڵهەڵگیر** (هەورا.): کۆڵهەڵگر.

**کۆڵێن** (شا.): کووپە، دەفرێکی گلێنی سوورکراوەوەیە.

**کۆڵێنانی:** جادووگەر.

**کۆڵێنکە** (شا.): گۆزەڵە.

**کۆڵی:** ناشێتی لە کارێکیدا. (زا.) شووێنێکە لە وولات، کە داگیر کرابێ لە لایەن دەوڵەتێکی بێگانەوە.

**کۆڵی بەس** (هەورا.): زڕکچ.

**کۆڵیت:** چاوە خانووێکی گچکە و پەڕپووت و نابووت و پەست و نزمـە جا لە ئاوایی بێ یا لە چۆڵی.

**کۆڵیت** (کورد.): تەویلەی ڕەشـەوولاخان، کۆریـت، دارێکـی گەورەیـە ناوەکەی هەڵکۆڵراوە ترێ و هەناری تێـدا دەکوشرێ. کولانـەی مریشـک و سەگان و چتی تر. (هەورا.) بۆسەی ڕاوکەران، کە خۆی تێـدا دەشارنەوە. (هەورا.) زنج، کووخ.

**کۆڵیتان** (هەورا.): کونێکـە لـەنێو دیواریدا وەکوو تاقەسێو و هـەنار و هەرمێی تێدا هەڵدەگرن و دەرگایەکەش دەگرن. (هەورا.) کونێکیشـە لـە دیواری بۆ پەنجەرە تێگرتنێ.

**کۆڵیتە** (هەورا.): کولانەی مریشکێ.

**کۆڵیتگا:** کەمینگا.

**کۆڵیدار** (زا.): داگیرکەر.

**کۆڵیژە** (هەورا.): کەویژە.

**کۆڵیس** (کە.): بێ شاخ، بێ قۆچ، کۆڵ.

**کۆڵی سووار:** کەسێکە سوواری باش نەزانێ.

**کۆڵین:** هەڵقەندن، هەڵکەندن، هـەڵکۆڵین، کێـلاّی. (ڕەوا.) کولانـە، ڕۆچنە.

**کۆڵـین** (خـۆ.، ڕەوا.): خەشـیو، سەوەشـیر. (ڕەوا.، گـەر.) مـرازی کەوچک کۆڵینییە.

**کۆڵینە:** مرازێکە ناوەندی کەوچکی داری پێ قووڵدەکرێ.

**کۆڵینەوە:** دووبارەدانەوە، گەڕان، هەڵگێڕ و وەرگێڕکردن، بەپووشکە ددان ئاژنینەوە. لێ ـــ: پشکنین، کنەکردن، ساخ کردنەوە.

**کۆم:** کۆما ،کۆمەڵـە، تـا. لەهەڤ کـۆم کـرن: لێـک کۆبوونـەوە. (ڕەوا.) تەن، (باد.، دزە.، ڕەوا.) پەنـدۆک، قـوون، ئـەندامی شـەرم، نێـوی قوونـی مرۆیان، (ڕەوا.) پۆز، سڵدان، (موک.) پل، (هەورا.) سوورە. (ڕەوا.) قـەفی گۆچانی. (دزە.، گـەر.) سـام، زەنـدەق، تـرس. ی لێکـرد: لێ ی ترسا، زەندەقی لێ چوو. چتی چەماوەوە، کوور، پشت کوور، داهاتوو، کـۆف، کـووف. ـــ بوونـەوە: داهاتنـەوە، چەمانـەوە، چۆمانـەوە، خوواربوونـەوە، کووڕبوونـەوە. (هـ.) کولـۆم. نـاوی دێیەکیـە لـە ناوچـەی سەنگاو، کە کانی خووێی تێدایە. ـ کردنەوە: چەماندنەوە، چۆماندنـەوە، خووارکردنەوە، کووڕکردنەوە، داهێنانەوە.

**کۆما:** کۆمـک، هەرە، هەرەم، کۆگە، کۆگا، کۆمـە، کـۆم، شـۆپ. ـــ بوون، خڕبوونـەوە، کۆمەڵـەبوون، ڕەپسـین. ـ کردن: ڕەپسـاندن، کۆمەڵـەکردن، نژلاندن، لەسەریەکتری دانان.

**کۆماج:** ڕێگایـەکی تایـەتییـە بـۆ پێداسەرکەوتن بۆ سـەربان. (شارە.) دارێکی پان و دوور و درێژە لـە ڕەشـماڵ گیراوە سـەری سـتوونی لێ قـاییم دەکرێ، کۆمانج. قنگـەبان. کـەوەر، تـەوەری ئاشـی. (ئـەردە.) جـوورە کولێرەیـەکی زەرد و نـەرم و شلی بـە چاوە دەخـورێ، کـەعک. (ئـەردە.) بۆرەن کوورە.

**کۆماجە:** تەپڵـەکی سـەر کۆڵـەکـە. تەپلـەک، تەختـەدارێکـە پان و درێـژە.

**کۆماچ:** بنکە، ئەو بەردە یا چیمەنتۆیەیە ،کـە لـەسـەر زەوی کۆڵـەکـەی لـە سەردادەنرێت.

**کۆماچە:** شەپۆلدانی ئاوە لەکاتی زۆرهاتن.

**کۆمـار:** تاقم، تـاخم، دەسـتە، بـەرە، چـەند ڕەشماڵێکـە، کـە پێکـەوە لـە شووێنێکی هەڵیاندابێ، کۆمەڵ، گەل.

**کۆمارێتی:** کۆمەلاّیەتی، گەلێتی.

**کۆماری:** دام و دەستووری ژیانی مەردووم، کە سەر کۆمار بـە هـەڵبژاردن دادەندرێت. لە جیاتی پاشا. *

**کۆمانەوە:** چەمانەوە.

**کۆمـانج** (جـا.، کـە.): دارێکـی نێوقووڵـە لـە نێوەڕاسـتی میچـی ڕەشماڵێدا دەگـیرێ، کـە ئەسـتوندەی وەبـەردرا سـەری ئەسـتوندەکە بچێتـە نێو قوولاّییێکەیەوە یا هەرچی وەوی بچێ.

**کۆماند** (باک.): شەڕ.

**کۆماو:** چەماو، کۆماوە.

**کۆماوە:** چەماوە، کەسێکە کۆم بووبێتەوە.

**کۆماوەوە:** چەماوەوە.

**کۆماویی:** چەماوی.

**کۆمایی:** جێگای نزمە لەنێو دەشتاندا.

**کۆمە:** کۆمایەک کاو یا چتی تـر، کۆمـا، کۆمـەڵ، کۆمەڵەیـەک لـە چت. (بـاک.) جـوورە شـیرنیاتێکە، کـە لـە دۆشـاو و ئـاردی دروسـتدەکرێ.

**کۆمەگ** (پژ.): یارمـەتی، یاریکـاری، هەوکاری. ـــ کردن: یارمـەتی دان، ئاوڕلێدانەوە، هارمـەتی دان. کۆمەڵـە، ئەنجومـەن. یارمـەتی دەر. ـــ ی: یارمەتی، چاوەدێری، کۆمەگکردن.

**کۆمەڵ:** ـــ گرتن لەدەورەی تەرم: چەمبـەرگرتن، چەمـەربەسـتن، (باک.) جەرد، گرد، خڕ، چەند کـەس یا چتێکـی خڕبـۆوەوە. ـــ یـک: هوولـە، دەسـتەیەک. ـــ بەسـتن: جڤان، ڕەبسـین. خـەرمانێکی سوورە، کە لەگەڵ سەپانی بەشکرێ و بکرێتە چەند کۆمەڵ.

**کۆمەلاّیەتی:** جڤاتی، هەڤانور، چۆنێتێکی جووانـە لـەناو کۆمـەڵێک لـە ئادەمیدا، کە بە یەکتریانەوە ببەستێنەوە. ـــ کردن: جڤاندن، خڕکردنـەوە، ڕەبساندن.

**کۆمەڵە:** کۆمەڵ، جڤـات، (بـاک.) جڤین، گۆمـەگ، هوومێـن. (بـاک.) زێوە، ئەلالـەت، بتۆم، سلسات، کۆم، پالـوتـە، قۆڵ، گەفەڵ، جوون. بە ـــ: تێکڕا، پێکەوە.

**کۆمەڵەبەستن:** جڤان، ڕەبسین، کۆمەڵ بوون.

**کۆمەڵەبوون:** کۆمەڵ بوون.

**کۆمەڵبوون:** گردکردنەوەی چەند چتێک.

**کۆمەڵتە:** کۆمەڵ.

**کۆمەڵکردن:** جڤاندن، خڕکردنەوە، ڕەپساندن، کۆکردنەوەی چەند چتێک.

**کۆمەڵکۆمەڵ:** کۆکۆ، کۆماکۆما.

**کۆمەڵگە:** جڤاتگە.

**کۆمەڵۆک:** جڤانۆک، کۆمەڵێکی گچکە.

**کۆمەڵی:** کۆمەلاّیەتی، بە کۆمەڵی.

**کۆمەوبوون** (ئەردە.): نووچ بوون.

**کۆمبوونەوە:** چەمانەوەی پشت بەهۆی پیری یا نەخۆشییەوە.

**کۆمڕ:** ڕەژوو، ڕەژی، خەڵووز.

**کۆمک** (باک.): کۆما، دەستە، کۆمەڵە ئەستێرەی کۆ، کۆمکا سێویا: تەرازووی ئاسمانیّ.*

**کۆملی** (هەورا.): بۆ کووێ دەچیّ.

**کۆمی:** کۆمۆ، پشت کۆڕ.*

**کۆمیه** (موک.): کۆم، سڵدان.

**کۆن:** دژی تازەیە، کەون، کۆنکیلە، کەونە، کەڤن، چەپلەک، چەپرەک، کەڤنارە، ئەنتیکە، کەڤنار، چتی زۆرکۆن. ــ بوون: کەونبوون، کرمنشین. ــ کردن: کەونکردن، کرمنشاندن. (هەورا.) کووانیّ، کووا، کووانی؟. ج ــ: لە کووێیە. (باک.، ئێرە.) کووێن، دەوار، خێوەت، چادر، مێژ؛ ــ ی خووە ژدار دانین: چادری خۆ هەڵدان. ــ خووە ڤەگرتن: چادری خۆ پێچانەوە.

**کۆنە** (هەورا.): کۆن، دژی تازە. جلکی کۆن، کووێنە، کەڤن، پرتاڵ، پرتۆڵ، ڕندۆڵ، تیتۆڵ، پرتۆکاو، پرتک، پەڕپیتاڵ، پرتۆک. چتێکی ڕەشە لە پێستی حەیوان دروست دەکریّ و خۆشیش دەکریّ بۆ ئاو تێدا خواردنەوە. (لو.) ئاگردان.

**کۆنەپەرست:** کەسێکە، کە حەز لە داب و ئاکاری کۆن بکات با ناڕەواش بن.

**کۆنەپەرستی:** سەختگیر بۆ ئاکاری کۆن.*

**کۆنەپۆش:** کەسێکە هەر کۆنە لەبەر بکات. ــ ی: پیشەی کۆنە لەبەر کردن. ناوی تیرەیەکی کوردە، کە لە سنووری پێنجووێن دادەنیشن.

**کۆنەپیاو:** پیر، پیرەمێرد. پیاوێکە لەنێوانی جحێڵی و پیری دابیّ و ژنی نەمابیّ.

**کۆنە چەکمەرەق:** مەبەس لە کەسێکییە هەبوویّ و لێکەوتبیّ و بە فیزیش بیّ.

**کۆنەژن:** پیرەژن. ژنێکە لەنێوانی جحێڵی و پیری دابیّ و مێردی نەمابیّ.

**کۆنەسووار:** کەسێکە لە کۆنەوە سووارچاک بوویّ. کەسێکیشە لە کاتی زۆرخانەدا دومەڵەک لیّ بدات. ــ ی: پیشەی سووار چاکێتی. کاری دومەک ژەنی زۆرخانە.

**کۆنەفرۆش:** کەڤنەفرۆش، کەڤنەگیر، کەونە فرۆش، کەسێکە لە کۆنەوە پیشەی هەر کۆنە فرۆشتن بیّ. ــ ی: کەڤنەفرۆشی، کەڤنەگیری، کەونەفرۆشی.

**کۆنەکردن:** کەڤنەکرن.*

**کۆنەمەشک** (باڵ.): حیز، بیّ زات، بیّ غیرەت.

**کۆنەیی:** کووێنەیی.

**کۆنتۆ** (شکا.): پارگووێری نێر.

**کۆندۆ:** کەندۆ، قسر، ئەستێوور، مانگایەکە شیری بدات، کاندەو.

**کۆنساڵ:** مەبەس لە مەردومی پیرە.

**کۆنشناس:** مێژووزان، ئەنتیکەناس. ــ ی: مێژووزانی، ئەنتیکەناسی.

**کۆنک** (باک.): تووکی نەرمی باڵندانە.

**کۆنکریت:** چیمەنتۆ و لم و چەوی گیراوەوەیە، کەبەکار هێنرابیّ. خانووی بە ئاسن و چیمەنتۆ.

**کۆنکریتی شیشدار:** خانووی بە شیش و چیمەنتۆ.

**کۆنگەرە:** کۆنگرە.

**کۆنگرە:** بورج، قۆنگرە، کۆنگەرە. ــ ی تەرازوو. ــ ی دووپشک.

**کۆنگرەبەستەی** (هەورا.): کۆنگرەبەستن، کۆبوونەوە.

**کۆنووس:** نوسراوێکە، کە چەند کەسێک لەبارەی چتێکەوە بینووسیّ و مۆری کەن.

**کۆنی:** کەڤنی، کەونی، بوونی چت بە کۆن.

**کۆنینە:** دێرین، دێرینە، چتی زۆرکۆنی مێژوویی.

**کۆونایرپژگنای** (هەورا.): کێوی ئاووڕێژێن.

**کۆه** (باک.): کێو.

**کۆی** (هەورا.): کێو.

**کۆیە:** شاری کۆیە.

**کۆیسنجاق:** کۆیە.

**کۆیلە:** بەندە، نۆکەر، زێڕخریدە. (هەورا.) کێوی، شاخی، کەژی. ــ یی: بەندەیی، نۆکەری، زێڕخریدەیی.

**کۆینە:** پەند، سەرکۆنە.

**کوت:** ناتەواو. (باد.) کۆڵووی نان. (فە.) کووت. سۆک، مەحەک. کەرت، لەت، پارچە، تیلمە، دەرقەل، (هەورا.) لت، زولاک. (ئەردە.) پەین. (دزە.) دەق، تەق. حنچک، سووک. ــ پێوەدان: وەبەر حینچکاندان، سووک پێوەدان. سەگی پیّ بانگ دەکریّ.

**کوتا:** کورت، کۆتا.

**کوتان:** لێدان بە دەست یا بە کوتەک (لیس). بۆ خروێرکە: پارزادان، خاڵ کوتان. داکوتانی سینگ و بزمار و ئیتر، تەپسین، تەپووکورت. ــ ی برنج: کووان، ساتن کوتان بە ئاش یا بە دەستاڕ و دینگ بۆ لابردنی پووشەکەی. غاردان. ووردکردنی خوویّ و ئیتر بە هاونگ و دەستاڕ و ئاش. خۆکوتان بۆ جێگایەکی فێنک و ئیتر. (باک.) تەویلە، کۆتان. سفتکردنی چتی تنراو.

**کوتانەجاو:** چت بەچاردا دانەوە.

**کوتاند ماووش** (ئەردە.): لەخەرکەماندان، ترازدان.

**کوتانەوە:** کوتاندنەوە، دووبارەکوتان، پەلاماردانەسەر، بەسەر و گووێلاک دادان.

**کوتاندن:** کوتان.

**کوتاندنەوە:** سفتکردنی چتێکی چنراو، پەستاندنەوەی چتێکی فشەڵ.

**کوتانک** (بابا.): پەچەی ئاژاڵان.

**کوتانن:** کوتاندن.

**کوتاننەوە** (ئەردە.): کوتاندنەوە.

**کوتانەوەملا:** بەملدادانەوە.

**کوتانن بەزەوینا:** بەزەوی دادان.

**کوتانن بەیەکا:** لێدان.

**کوتە:** خواردەمەنیەکە لە گووێز و تووی کوتراو یا خورما و گووێزی کوتراو یا قەزوان و تووی کوتراو یا ناوک و تووی کوتراو پێکهاتبیّ. دەنگێکە وەک دەنگی کوتانی چت، کوتەکوت، کەتەی یەک لە دووای

یەکتری. دەنگ و باس. لەت، کوت، پارە. ڕێگایەکە بەسەر بەفرە بەسەرێدا بڕوا یا ڕەچەیەکە بە نێو بەفرێدا شکابێ. (شن.) کۆڵووی تەندووریّ، (شن.) کووتە. (باد.) کفتە.

**کوتەبڕ** (باک.): کورت. ــ کردن: کورتکردن.

**کوتەک**: پەیاخ، گۆپاڵ، مەترەق، لیس، چۆماخ، چۆماتر، مرخە، گوورز. دەردەستێکی ئەستوور و سەرخڕە.

**کوتەفڕ** (باک.): هەنگووین.

**کوتەکەلەکە** (ئەردە.): سووالەت.

**کوتەک بەدەست**: گۆپاڵ بەدەست، گورز بەدەست. *

**کوتەکەلەکە**: کەلەکە.

**کوتەکدان**: لێدان.

**کوتەککاری**: گاوسەر، چێوکاری.

**کوتەکوت**: بۆڵەبۆڵ، پرتەپرت، هەللاهەللا، دەنگەدەنگ، باسوخواس، زۆر لەگەڵ کەسێکی کوتن. وەڕینی سەگ.

**کوتر** (ئەردە.): کورت، کۆتاه.

**کوتران**: گەلفین، گەمشین. گووانی شووێنێک لە ئەندام بەهۆی ئازار پێگەییشتنەوە.

**کوتراو**: (ڕۆژ.، دەر.) تلپ، (باک.) لێدراو، هێلە.

**کوترهاتن**: کۆتاهاتن، کوترهاووردن، مانیان.

**کوتک**: گوجیلەسەگ و بەچکەی وورچ و گورگ و ئیتر. ــ ی هەللاجی: (ڕۆژ.) چەکە. کوتەک. کوتکی جل شوشتنێ، جلشۆر، دێوەج، مەرکووت، مەیکوت، (کە.) مکۆ، گلارکۆ، تێلاّ، کلاوکوتک، دارکوتکە، میرکوت، شۆلک، شۆنک، شوونک، گەلاکوتک.

**کوتکە**: توتکەسەگ. *

**کوتکران**: بڕوانە: کوتکردن. *

**کوتکردن**: پەیناوکردنی زەوی. لەتکردنی چت، داکوتانی سنجووق بەزەویدا لە یاری سنجووقێنێدا.

**کوتکوت**: پارچەپارچە، جڕەجڕ. ــ کردن: پارچەپارچەکردن، پچڕپچڕکردن. کووتکووت. ووشەیەکە سەگی پێبانگ دەکرێ.

**کوتکێش** (ئەردە.): پەین کێش. ــ ی: پەین کێشی.

**کوتلک** (باک.): کفتەی بڕوێش یا ساوار یا گەغەکوتاو و گۆشت.

**کوتمە** (ڕەوا.): کۆڵ (لە دەست یا لە پێ).

**کوتن**: ووتن، گۆتن، گۆهتن، مووشن، وەشن، ویشتن، (کەل.) ئوشن، ڤتن، مییەن، بێژتن، بێژان، واتن، ویژتن، واتەی، هووڵتن. بڵێ: بێژە.

کوتۆز

**کوتۆز** (باک.): کلاو.

**کوتوەشانن** (ئەردە.): شووک وەشاندن، سووک پێوەدان.

**کوتووپڕ**: لەنەکاو، لەناکاو، لەپڕا، کوتومت، دەست بە جێ، یەکاویەک. پەرکەم، دەردێکە لە پڕا دڵی مرۆی ڕادەگرێ و دەمرێ. کوتوو مزرەقی، ناگەهان، مەرگی کوت و پڕ.

**کوتوکوڵک**: وورده خورییەکی ناشیرینە، کە دەڕێسرێ بۆ دروونی دەمی گونیە و تەلیس و جەواڵ و ئیتر.

**کوتووکووێر**: مرۆڤی چاوکز.

**کوت و لەت**: لەت و پەت.

**کوت و مت**: ووشەیەکە بەکاردێنرێ بۆ وێکچوونی دووچت لەگەڵ یەکتری، دەق، تەق. ــ کردن: پارچەپارچەکردن.

**کوت و مزرەقی**: ووشەیێکە بەکاردێنرێ لە جێگای کوتووپڕ.

**کوتێ شەو**: پارچەی لەشە، جکێ لەشە.

**کوتی** (زا.): گوڵ.

**کوتیار**: ووتەر، ووتیار، بێژەر.

**کوتیاگ**: ووردبووگ، کوتراو، ووردکراو، هاڕڕاو.

**کوتیان** (ئەردە.): کوتران، خۆشکران، شۆڕاو، هارران، هاڕڕان، مانیان. خاوێنکراو.

**کوتیلک** (باد.): کفتە.

**کوجیلە**: کوچوولە. ئەستوندە درێژەکەی نێوەڕاستی خێوەتانە.

**کوچ** (ئەردە.): ئیفلیج. گۆج، کۆڵ. (هەر.) کووچ، کووچ کووچ، سەگی پێ بانگ دەکرێ. کوچک، بەرد، دیزەی چکۆڵە.

**کوچک**: (باک.) بەرد. دیزەی چکۆڵە.

**کەچەڵ**: چالاو.

**کەچەڵە**: چالاوە. کۆجوڵە: کۆجیلەی دار.

**کۆچەڵەبەس**: چەند کۆجەڵەیەکی قوڕینە لەناو جۆگەی ئاوی تەنیشت تیری مەرەزەدا دادەنرێ تا ئاوەکە لەم کۆچەلانەوە دابەش ببێ بەسەر تیرەکەدا بەیەکسانی.

**کوچەڵە**: چتێکە وەک دەمەکەوچک لەقوڕ دروستدەکرێ و لەقەدی دارە قەزوانی قایم دەکرێ، کە دارەکە برینداز بکرێ بنێشتەکەی دەتکێتە ناوی. (ئەردە.) باڵندەیێکە، کە پەڕی منداڵێتی فڕێدابێ بەلاّن پەڕی گەورەی دەرکردبێ.

**کوچک** (باد.): ئاگردان. (لو.) کەڤر، بەرد.

**کوچکانی** (باک.): قۆچقانی. (دەر.) ئاوورگ.

**کوچکاوور**: ئاوورگ.

**کوچکە**: سێ بەردە لە جیاتی سێ پایە لە ژێر مەنجەڵ و دیزە و ئیتر دادەنرێت. ــ بەرد: سێکوچکە. ــ ڕەش: بەردەڕەشە. ــ هەسان: بەردەهەسان. ــ بنەڕەت: خەرسەنگ، بەردی بنەڕەتی.

**کوچک تاش** (ئەردە.): بەردتاش.

**کوچک تراش** (فە.): بەردتاش. (فە.) ــ ی: بەردتاشی.

**کوچک تێرە**: سەنگی تیرە.

**کوچک جلشوشتن**: کوتکی جلشوشتنێیە.

**کوچک چەخماخ**: بەردی چەخماخی، بەردەستێ.

**کوچک چن**: بەردچن، کەسێکە، کە دیواری بەرد بەووشکە کەڵەک دروست بکات. دیواری ووشکەکەڵەک.

**کوچک ڕەش**: بەردی ڕەش.

**کوچک ڕێژە** (ئەردە.): جوورە بەردێکە، بەردی شووشەی.

**کوچک سەخت**: بەردی ڕەق.

**کوچک فەرش:** بەردفەرش.

**کوچک قەلباز:** فرکەباز.

**کوچک قەلەسک:** بەردی کژچەقانی.

**کوچک تانکە:** بەردی هەستەشکێن، سەنگی هەستە.

**کوچکوچ:** کوتکوت، کوتکوت، ووشەیێکە سەگی پێ بانگ دەکرێ.

**کوچکووچی چەخماخ:** بەردی چەخماخی.

**کوچک و کووانک** (ئەردە.): وەجاخی ئاگر. دارا بەـــە ڕازی نییە.

**کوچک هەسان:** بەردەهەسان، هەسان.

**کوچوولە:** کوچوولە.

**کوچوولـە:** دەرمـانێکی بـۆری کوژندەیـە، باقەیەکـە لـە گیـای گویـش کەنرابێتە ناوناو، کوچوولە.

**کوچێ** (هەورا.): نەختێ بۆ نەرم بوون و ڕستنی.

**کوچیلە:** کورچیلە، دەرمانێکی چۆلەکە کوژتنێیە پانپانە و لەلای ووردە. والەفرۆشان دەستەکەیێ بە گەفیییەوە دەیکوڵێنن گەفەکەی بۆ چۆلەکەی دادەنێن، کە بیخوا پێی دەمرێ.

**کوخک:** قف، کۆخک.

**کوخکی** (زا.): کەسێکە تووشی کۆخەی بووبێ.

**کۆخیان:** کۆخین: قخین، کوخین.*

**کۆخیاندن:** کوخین: کۆخین.*

**کودانن** (باک.): ئاژۆتن، زوو جێ بە جێ کردنی کار.

**کودوو:** کوولەکە.

**کودوولیفکە:** لیفک، کدرولیفکە.

**کودی** (هەر.): کورلەکەی خواردنێ.

**کوڕ:** دایک و باب دوو جووره منداڵیـان هەیـە نێرینەکـە کوڕە و مێینەکـە کچـە. (بـاک.) کـورت. سـەری خووە ـــ کرن: مووەکانی کورتکردنـەوە و هەڵپاچین. (باک.) قـوڕ، مـەرێکـە نیـوەی گوێی بڕابێ، مـەری کەڕیلـە. کوڕوو. (باد.) شووێنی قووڵ لە زەویدا. نێرینەیەکە ژنی نەهێنابێ.

**کوڕاپ** (باک.): کوڕەمام.

**کوڕادە:** سیرمۆکە، سیرەمۆک، گیایـەکی کێوییـە گـەڵای درێـژە هـەروەکوو کەوەری وایە، بەڵاَن تیژترە و پەلکیشی لەوی باریکترە، (دەر.) قوڕادە، قوڕایە، (بانە.) کنیواڵ.

**کوڕاگ:** کارگ، قارچک، دومبەڵان.

**کوڕانە:** وەکوو کوڕان، وەکـوو خوو ڕەوشـتی کـوڕان، چتێکـە هـەر لـە کـوڕ بووەشێتەوە یا لە کوڕ بشێ.

**کوڕاندن** (هەر.): ماء کردن، دەنگی بەرخییە.

**کوڕانگرتـوو:** گۆشـتی سمـتی مرژڤانـە، بـۆ جنێویـش بـەکاردەبرێ.

**کوڕانی:** ئافرەتێکە بەرگی پیاوانی پۆشی بێ و کردەوەی وە پیـاوان بچـێ، (کۆ.) کەسلە، کچێکە خووی کوڕانی بێت.

**کوڕە:** کوڕ، کوڕی باوک، باوکی کوڕ. خڕ، گرد، وەکوو تۆپی خڕ.

**کوڕە** (ئەردە.) تومووش، کارێز.

**کوڕڕە:** گورگ، کوڕی، جوانوو.

**کوڕڕە ئەسپ** (فە.): جووانووە ئەسپ، (کەنێر بێ).

**کوڕڕە ووڵاخ:** هوڵ، هۆڵی کەران.

**کوڕڕە ئێستر:** (باد.) کوریک.

**کوڕەبارا** (گەر.): قاپووتێکی کورت و بێ قۆڵە.

**کوڕەباڤ** (باک.): پڕدل، ئازا.

**کوڕەپا** (ئەردە.): پاکوڕە، بێچووە کوللە.

**کوڕەبەشە:** قوڕەبەشە، قوڕەبەشـک، چووالـوو، کـوڕی بەشـک، کـوڕی بەچک، داعبایەکە وە سەگی دەچێ و بەقەد کاریلەیەکی چکۆڵەیە قەڵـەو و نێوچاوان بەشە و لەشیشی قژەڵەکە ڕەش و سپیە پشتی بستێک پانـە وەکوو هیزەی ڕۆنییە و درێژە، دوولاقی کورتی هەیە لە شەرێدا زۆر درە.

**کوڕبۆر** (هەر.): مەڕێکە گوێی نەدرێژ و نەکورتبێ، بـەڵان شۆڕ بێ و سەرگوێ و هەموولەشی بۆر بێ.

**کوڕەپا** (ئەردە.): پێکوڕە.

**کوڕەتاڵەبۆر** (هەر.): مەڕێکە گوێیـەکانی نەدرێژ و نەکورت بن، بـەڵان شۆڕ بێ و سەر و ملی دێخدێخ بێ.

**کوڕەتاڵەتەبەش** (هەر.): مەڕێکە گوێیـەکانی نـەدرێژ و نـە کورتـبێ، بەڵان شۆڕ بێ، سەر و ملی نوختەنوختـەی سوور یا ڕەشی پێوەبێ و لـەشی سپی بێ.

**کوڕەتاڵەڕەش** (هەر.): مەڕێکە گوێیەکانی نەدرێژ و نە کورتبێ، بـەڵان شۆڕ بێ، سەر و ملی دێخ دێخ و لەشی ڕەشبێ.

**کوڕەتاڵەسپی** (هەر.): مەڕێکە گوێیـەکانی نـەدرێژ و نـە کورتبێ، بـەڵان شۆڕ بن، سەر و ملی دێخدێخ و لـەشی سپی بێ.

**کوڕەتاڵەسۆر** (هەر.): مەڕێکە گوێیـەکانی نەدرێژ و نەکورتبێ، بـەڵان شۆڕ بن سەر و ملی دێخدێخ و لەشی سووربێ.

**کوڕەتاڵەشین** (هەر.): مەڕێکە گوێیـەکانی نـەدرێژ و نەکورتبێ، بـەڵان شۆڕ بێ سەر و ملی دێخدێخ و لـەشی شین بێ.

**کوڕەتاڵوو:** گیایەکە.

**کوڕەتەی** (هەر.): مەڕێکە گوێی نەدرێژ و نـەکورتبێ، بـەڵان شـۆڕ بـێ و سەروگوێ و هەموو لەش و ملی پاکی سپی بێ.

**کوڕەخاڵ:** خالۆزا.

**کوڕەدار:** قایە، دارێکیشـە، کـە مێـوەی پێـدا هەڵگـەڕابێ و ئـەوداره بـۆ مێوەکە تەرخانکرا بێ.

**کوڕە ڕەش** (هەر.): مەڕێکە گوێی نە درێژ و نە کورتبێ، بەڵان شۆڕ بێ و سەر و گوێ و هەموو لەشی ڕەش بێ.

**کوڕەڕسەر** (هەر.): مەڕێکە گوێی نـەدرێژ و نـەکورتبێ، بەڵان شۆڕبێ و سەر و ملی بۆر و لەشی سپی بێ.

**کوڕەڕسەر ڕەش:** مەڕێکە گوێی نەدرێژ و نەکورتبێ، بەڵان شۆڕبێ و سەر وملی ڕەش و لـەشی سپی بێ.

**کوڕەر سەرشین** (هەر.): مەڕێکە گوێی نەدرێژ ونەکوتبێ، بـەڵان شۆڕبێ و سەر و ملی مـەیلە و شین و لـەشی سپی بێ.

**کوڕەزا:** نەوە، مندا ڵی کوڕ.

**کوڕەزازا:** مندا ڵی منداڵی کوڕ.

**کوڕەزاگ** (ئەردە.): کوڕەزایانەوە، وەچەزا.

**کوڕەسپی** (هەو.): مەڕێکە گوێی نەدرێژ و نەکورت بێ، بەڵان شوێڕبێ و سەروگوێ و هەموو لەشی سپی بێ.

**کوڕەسوور** (هەو.): مەڕێکە گوێ ی نەدرێژ و نە کورت بێ، بەڵان شوێڕبێ سەروگوێ و هەموو لەشی سووربێ.

**کوڕەشین بۆر** (هەو.): مەڕێکە گوێ ی نەدرێژ و نەکورت بێ، بەڵان شوێڕبێ و سەروملی شین و لەشی سپی بێ.

**کوڕەک**: کێوێکە کەوتۆتە لای باشووری ڕەواندزێوە.

**کوڕەک**: زمانەی قفل و ئیستر. ناوەڕاست. (هەورا.) نێرتکی پیوازی.

**کوڕەکەڵ**: نێری یە کێوییە، کە پێی نابێتە دوو یا سێ ساڵی یەوە.

**کوڕەک دل** (ئەردە.): کورکەدڵ، فەرەجی، دەنگی نەسپی لەمڕێکای دانی ئاڵیکی دایە.

**کوڕەکەمەر** (باک.): مەڕێکە گوێ ی براپێ و ڕەنگی وەکوو بەڕووی بێ.

**کوڕەگووێ**: بارەگووێ کەوتوو، گوێلکی ساوایە بای ڕەگووێی کەوتبێ.

**کوڕەلاش** (هەو.): گیایەکە وەکوو ئاڵەکۆک وایە و دەخورێ و چەورە بەڵان گەڵای چکۆڵەترە.

**کوڕەک لغاو**: زووانە.

**کوڕەلاو**: گەنج.

**کوڕەمام**: کوڕاپ.

**کوڕەنگ** (فە.، لو.، لک.): هۆبە (کە چەند خێوەتێکە).

**کوڕەوەزەمینی** (هەو.): کۆی زەوی.

**کوڕەوێڵە** (موک.): پەڕەووڕێکە.

**کوڕبەرگین**: بەرزا، دژی دوا.

**کوڕبۆری** (باک.): لوولە.

**کوڕپە**: (کە.) کرپە، خورپە. کڵپە. ـــ لەدڵکەوتن: خورپە لە دڵکەوتن، گڕ لەدڵ بەربوون. (باک.) فێنک، تازە.

**کوڕپەکورپ**: کرپەکرپ.

**کورت**: (فە.) کوڵ، کوت، کوور، قوڵە، کن. ـــ بوون: کن بوون. ـــ کردن: کن کردن. (باد.) باڵندەیەکە ڕەنگە خەرتەڵ بێ. (زا.) چاڵ.

**کورتان**: شبری، پاڵان، (هەورا.) کۆپان، سەکار. ـــ ی کۆڵپەڵگران: (باک.) بەرپشت.

**کورتانە** (دزە.): فەرخە کوللەیەکە لە پێکوڕە گەورەترە کەمکەمە دەست بە ڕۆیشتن دەکات.

**کورتانەروو**: (باک.) کورتانکەر، پالاندوور، (ڕۆژ.) کوپاندروو.

**کورتایی**: (هەورا.) کولاّیی، کورتی.

**کورتە** (زا.): وولاّخی نارەسەن. کورتەک. کورتکراوەوەی چتێک. جووره کراسێکی قۆڵ کورتە. قرتە. خرمە. خرپەی دڵ، کورتژن.

**کورتەبالاّ**: بەژن کورت، کوڵەبالاّ، خرپنە، گمن، گرگێ، کورتەبنە، خرپلە، خرپلانە، (باک.) بەژنهووت، قوڵەبنە، خشپن.

**کورتەبنە**: کورتەبالاّ، قوڵەبنە.

**کورتەک**: کەوا، کەوی، کولۆجە، کولەجە.

**کورتەکەڵەکە**: چۆلایی ئاستی کەلەکە.

**کورتەکەوا**: کەوایەکی پرتەریبی ناوداره لە لبادە درێژترە لە کەوا کورتترە.

**کورتەکورت**: قرتەقرتی مریشکانە.

**کورتەڵ** (باک.): وورتکەنان.

**کورتەڵە**: کورتەبنە.

**کورتەوکردن**: کورتکردنەوە.

**کورت بڕی**: کوتن یا نووسینی مەبەستێک زۆر بەکورتی.

**کورت بوون**: کۆتابوون.

**کورت بوونەوە**: کەمبوونەوەی چت لە باری درێژی.

**کورت بین**: (باد.) هزرکورت، تێنەبین. ـــ ی: (باد.) هزرکورتی، تێنەبینی.

**کورت خەس**: قرتاندنی نێرکی تووتن لەسەر گەڵاوە تا باڵا نەکات.

**کورتژن** (فە.): خورپە، خرپە، خرمە، کورتە.

**کورتکردن**: کەمکردن.

**کورتکردنەوە**: کەمکردنەوەی درێژی چت.

**کورتم**: چتێکی نەستووری درێژە.

**کورتمە**: کورتم.

**کورت و کوویژ**: کەل و پەلی کورت و تەسک.

**کورتوین** (هەورا.): کورت بین.

**کورتی**: کوڵی، قوڵی، بوونی چت بە کورت. لەجیاتی (بەڵای کەمەوە)ش بەکاردەبرێت؛ دارا کورتی حۆقەیێکی ترێ خوارد. کەمی، کێمیاهی. لە ـــ دان: زیان هێنان. درێغی، کۆتایی، کۆتاهی.

**کورتیلانە**: زۆر قەد کورت.

**کورتیلە**: کورتەڵە.

**کورخووال** (باک.): کوڕەخاڵ.

**کورد**: پاڵەوان، ئازا، نەبەز، چاونەترس، بەهێز، زۆردار. نێوی تیرەیەکیشە لە نەتەوەی کورد، کە لە لای ڕۆژاوای باشووری کۆیە دادەنیشن. کاردۆک، کرمانج، ماد، کوردمانج، نەتەوەیێکی کۆنی ئارییە لە نێوەڕاستی ئاسیایەدا خاکەکەی کوردستان زۆر بەرفراوانە بە سەر تورکیا و سووریا و ئێران و عێراق و رووسیا (ئیرەوان) و بلووچستان دابەشکراوە ئەگەر سەرژمێرێکی دادگەرانە بکرێ (٣٠) میلیۆن پترە لەوانەیە خۆ لە چل میلیۆن بدات.

**کوردانە**: ژیان و زمانی کوردان. وەکوو کورد: ـــ و مەردانە وەرە مەیدانێ.

**کوردایەتی**: کوردێتی، خەریکی کاروباری کوردان بوون.

**کوردەکوژە**: کوردکوژە، جووره ترێیەکی گلوو گەورەیە.

**کوردەواری**: کوردستان.

**کوردپەروەر**: کوردێکە ڕێزی کوردایەتی بگرێ. ـــ ی: هەوڵدان بۆ ڕێزگرتنی کوردایەتی.

**کوردچێتی**: کوردچیەتی.

**کوردچی:** کەسێکە بەسەر وماڵەوە بۆ ڕزگاری کوردستان لە خەباتێکی نەبەزانە و بێپسانەوە دابێ.

**کوردچیەتی:** کوردچێتی، بەسەروماڵەوە بەبێ دریغی بۆ ڕزگاری کورد و کوردستان زۆرنەبەزانە و بەبێ پسانەوە تێکۆشان.

**کوردستان:** خاکی کوردان ئەو شوێنەیە، کە گەلی کوردی تێدا دانیشتووە، کە سنووری لە ژوور کەنداو (خلیج) ی فارسی یەوەیە بە دیوی ئێرانیدا دەست پێدەکات تا نزیک دەریای ڕەش و لە کرماشانەوە تا ئەسکەندەروونە، چووارسەدهەزار کیلومەتری چووار گۆشەیە وەکوو لە تەنیشت ناوی کورد دا باسم کرد دابەشکراوە بەسەر تورکیا و سووریا و عێراق و ئیرەوان و ئێران و بلووچستان .

**کوردشناس:** خەریک بوون بە باسێکەوە، کە بەندیواری بە کوردەوە بێ. ـــ ی: کوردناسی.

**کوردەکوژە:** جوورە خورما و ترێیەکە.

**کوردمانج:** کرمانج، کورد. ـــ ی: کرمانجی، کوردی.

**کوردۆ:** ناوی پیاوانە، لەمزۆر چاخان بە کوردیان گوتوە. جوورێکە لە مەقامی قۆریات.

**کوردێتی:** کوردایەتی.

**کوردی:** زمانی کوردی، کوردەواری، جلکی کوردی، شێوە و کرداری کوردی، هەوای گۆرانی و بەستەی کوردی. (زا.) جوورە خواردەمەنیەکە، کە لە هەرزنی کوتراو دروستەدەکرێ.

**کوردیتی:** کوردچیتی.

**کورزە:** جەواڵ.

**کورز:** لۆچ، کرژ. (شا.) کشت.

**کورژە:** کورژ، کرژ، (هەورا.) هۆرامای. ـــ کردن: کرووژم هەڵاتن، وێکهاتن، کرژهەڵاتن.

**کورس** (باک.): دەوەن، پنجک، داری کورت. (کە.) جێ گیر، چوونەسەر. ـــ بەستن: جێگیر بوون.

**کورساندن** (باک.): کرۆستنەوە، کورۆستنەوە، کرۆتن.

**کورسک** (باد.): هەرمێ کێویلە.

**کورسکەر:** جۆلاً.

**کورسی:** سەندەڵی، ڕوونشتەک، تەختێکە لە دار دروستکرابێ بۆ دانیشتن یا بۆ لەسەر نوستن. (نەه.) خلێنە، دەدان.

کورسی

**کورسی کورسی:** چتێکە وەکوو چەرخ و فەلەک چووار کورسی پێوەیە منداڵان دەچنە سەری دەخولێتەوە و بەرز و نزم دەبێتەوە.

**کورسین** (باک.): کرۆسرانەوە.

**کورش** (کە.، هەو.، هەر.): بۆ بانگ کردنی گوێدرێژان بەکاردەبرێت بۆ هێسترانیش کوڕکوڕ.

**کورشە** (باک.): بەفرە بەسەر، بەفرێکە کەوتبێتە سەریەک و ڕەقهەڵاتبێ.

**کورشک:** کەروێشک.

**کورشەهەڵاتن:** چیچکەکردن بەکزی یەوە.

**کورک** (هەورا.): گەندەتووک، تفتیک، تووکێکی زۆر نەرمە لەبن مووی بزنی دەردێ. (کە.، هەورا.، بابا.) کڕ، قەپک. ـــ کەوتن، کورک بوون. ـــ بوون: کرکەوتن. مەرز، مەرەز. (باک.، یەز.، بۆ.) گیرفان. بەرگن.

**کوڕک:** (باک.) پێست، پۆست، قاپووت، فەرەجی. (دزە.) کوێرۆ، کوێڕۆک. (باک.) کوڕ، منداڵ، نۆکەری منداڵ. (بار.) کۆخە، کۆکە.

**کورکاندن:** نووکاندنی مندا ڵ، کورکەکردن.

**کورکاندن:** کورکاندنی ئەسپ لە کاتی ئالیک دانێدا.

**کورکە** (کە.): میتکە، (کە.) بەللوکە، قیتکە، ئەو گۆشتەیە، کە لەنێو ئەندامی شەرمی ئافرەتاندایە.

**کورکە:** قیتکە، باڵۆکە. نووکە، نووکەنووک، گریانی منداڵانە بەنووکە نووکەوە، دەنگی گریانی هێواشە. دەنگێکە لە وولاخی بەرزەی یەکسەمەوە دێ لە کاتێکا، کە دەمی ئالیکی هاتبێ. لووشکەلووشک و لێوەلەرەی چارەوێیە بۆ ئالیک.

**کورکەکورک:** کورکەی یەک لە دووای یەکتری.

**کورکەنیسان:** گوڵاڵەسوورە.

**کورک دڵ:** توخمی دڵ.

**کوڕکۆ** (هەر.، بار.): کوڕێژگە، لە کاتی بانگ کردنێدا بەکاردێت.

**کوڕکوڕ:** کوڕووش کوڕووش، گوێدرێژی پێبانگ دەکرێ. سەنگی ئاشکەنگ.

**کوڕکوڕە** (کە.): جوورە باڵندەیەکی سوورخونە و بۆرەقنەی بێ بیرە بەقەد کۆترێکییە، کەرەواڵە، کووڕکووڕ، کەت، ترەوژە قەتی.

**کوڕکۆرە:** کونێکە لە پاڵ دژڵیانی ئاشیدا ئاشەوان هاتوچۆی پێدا دەکا بۆ ژێر دژەقە.

**کوڕکوڕۆچکە:** کرکرۆچکە، کرکراگە.

**کوڕکوڕۆژە:** کرکراگە، کرکرۆچکە.

**کوڕکوڕۆک** (باک.): مێشوولەی زۆر وورد.

**کوڕکوڕی** (کە.): پەڵەپەڵەسوور، چین چین، سوورخون.

**کورکی یان** (ئەردە.): کورکەکردنی وولاخ بۆ ئالیک.

**کورگ** (فە.): خامی ئەستوور، مەرەز، بەرگن.

**کورگ** (ئەردە.): جووانوو.

**کورگە:** قیتکە.

**کوڕگەل** (کە.): کوڕەکان، کوڕان.

**کورم** (باک.): کرم.

**کورمام** (باک.): کوڕی مام، ئامۆزا.

**کورمانج:** کرمانج، کوردمانج، کورد. ـــ جی: کرمانجی، کوردی.

**کورمژین:** کرمێ بوون.

**کورمردگ:** کورمردن.

**کورمس** (خۆ.، هەو.): دارێکی کێوییە لق و پۆپیان لێ کردبێتەوە، بەپیرەدارێکیش دەڵێن، کەلق و پۆپی لێ بووبێتەوە و تەنها قەدی مابێ.

**کورمۆ** (باک.): کرمێ.

**کورمۆیی** (باک.): کرمێداری.

**کورمێ**: کرمێ.

**کورمی** (باک.): کرمێ.

**کورن** (زا.): دۆڵی بەردە، کە ناوی تێ بکرێ.

**کورنوو**: کرنۆش.

**کورنووشبردن**: کرنۆشبردن.

**کورنیشک** (باک.): گۆشە، قولینچک.

**کورۆتەی** (هەورا.): کرۆژتن.

**کورۆتن**: کورۆژتن.

**کورۆچانن** (ئەردە.): کورۆژتن.

**کورۆچانی**: کورۆچان، کرۆژتن.

**کورۆچکورۆچ** (ئەردە.): کرکراگە، کرکرۆچکە.

**کورۆچنای**: کرۆژتن، کورۆژتن.

**کورۆز**: پۆلاکرۆژ، ئازا، مەرد.

**کورۆژتن**: کرۆژتن، کورۆشتن، کرۆتن.

**کورۆژین**: کرۆژتن.

**کورۆسک**: هەرمی کێویلە.

**کورۆک** (جەبا.): ڕەگی گیا و ئیدیکەیە.

**کورۆش**: کولۆش.

**کورۆک**: نێرک، کاکڵ.

**کورۆڵ**: کلۆل، کولۆ.

**کورۆشە**: کرمێکی سوورکەڵەیە لەسەردەمی قەفە و گولاندا لە گەڤی دەدا ووشکی دەکا.

**کورۆشتن**: داکرتاندنی چتی ڕەق بەددان.

**کوروو** (شار.): نێرتکە پیواز.

**کوروو**: ووشەییکە، کە وولاخی یەکسمی پێ بانگ دەکرێ، جاشکە.

**کوروویرای** (هەورا.): کوڕی برا، برازا (کە کوڕبێ).

**کورووچەڵێ** (هەورا.): کرکرۆچکە.

**کورووچ کورووچ** (هەمو.): جووانووی پێ بانگ دەکرێ، کوڕی کوڕی.

**کورووچنای** (هەورا.): کورۆژتن.

**کوروور**: کولوور، ٥٠٠٠٠٠، پێنجسەد هەزار.

**کورووز**: گیاندار و درەختی سیسی بێ کەیف.

**کورووزانەوە**: کرووزانەوە، باسی نەبوونی و پەرێشانی کردن لەلای خەڵک، ناڵە و گریانی منداڵ بە هۆی نەخۆشییەوە.

**کورووزەکورووز**: کورووزانەوەی یەک لە دووای یەکتری.

**کورووزمان** (باد.): پەچەی مەر، کورووزیان.

**کورووژم**: کرووژم، زیپک. ــ هەڵاتن: کرووژم هەڵاتن.

**کورووش** (کە.): بۆ بانگ کردنی گوێدرێژان بەکاردەبرێت، کوڕکوڕ.

**کورووکاڵ** (موک.): کوڕانی عازەب، بەچەند لاوێکی تازە پێگەییشتوو دەڵێن، کە کۆبوونەوە.

**کوروولە**: جاش.

**کورووهر** (هەمر.): ئەسپی پێ بانگ دەکرێ.

**کورهەڵی** (باک.): زڕکوڕ.

**کوڕێتی**: کوڕێتی.

**کوڕێنی**: جحێڵایەتی، تافی گەنجایەتی کوڕ.

**کوڕی**: مەڕێکە بێ گوێچکە بێ یا نیوە گوێچکەی ببێ. (باک.) کونێکە، لەکاناندا دەکرێ. هۆلی جووەنوو، جووانوو. مەڕێکە خوری. یەکەی لێکرابێتەوە و ڕووتبێ. (فە.) جاش، جاشک.

**کوڕی**: وولاخی بەرزەی پێدەنگ دەدرێ، بۆ ئاژۆتنی وولاخی بەرزە و جوانوو و جاشەکەر بەکاردەبرێ لەکاتی لێخوڕینیدا.

**کوری** (باد.): کلک.

**کوڕی بەچک** (باک.): کوڕەبەشە، کوڕی بەشک.

**کوڕی بەشک** (باک.): کوڕەبەشە.

**کوڕیتی** (باک.): ئەو ماڵاتەیە لەمووزی لە ئاوێ بنێ بۆ ئاو خواردنەوە.

**کوڕی چەنگ** (باک.): پنچکە دارێکی کێوییە.

**کۆڕی دڵداران**: کۆڕی گراو و سەوداسەران.

**کوڕیزەک** (باک.): کرکرۆچکە.

**کوڕیژگە**: لاوکۆ، لاوژە، کوڕکۆ، لاویژە، کوڕی گچکە، لەکاتی بانگ کردنی کوڕاندا بەکاردەبرێ، هۆی کوڕە.

**کوڕیس**: مەڕێکە و کاوڕێکە گوێچکەی گچکە و دەم و چاوی سوورکاڵبێ.

**کوریش** (ڕۆژ.): مەڕی گوێ کورت.

**کوریشک**: لۆچ و چینی جلکانە.

**کوڕی کوڕی**: بۆ دەنگدانی یەکسمانە، بۆ بانگ کردنیشیان دەبێ، کورووچ کورووچ.

**کوڕیلە**: کوڕوولە.

**کوڕین** (باک.): جاش، جاشک.

**کوڕیناس** (باک.): تێگەییشتوو، چاوکراوەوە.

**کوڕینجک** (باک.): گیایەکی کێوییە و ناخورێ.

**کوڕینگان** (باک.): جوورە پاقلەیەکە.

**کوڕیهێ** (هەمر.): هەیهە، بۆ ئاژۆتنی ئەسپ و مایینان بەکاردەبرێ.

**کوز** (زەن.): قوز، کوس، زێ، ماڵ، ماڵە، زها، زەها، زە، زهێ.

**کوزمسووتەکێ**: قوزمسووتەکێ.

**کوزبڕکە**: قوزبڕکە، ملّە، هوولە، داعبایەکی درێژی بەقەد بەرووی دەبێ دەفڕێ و باڵدارە ڕەنگیشی وەکوو بەڕووە، مۆورکارە مێملی جۆگەیە هەمیشە مێملی شیناتییە ڕەگ و شارەگەکەی دەردێنی و ووشکی دەکات.

**کوزر** (موک.): کوێزر، دەخل دووای گێرەکران و بەباکردنی ئەوانەی، کە لەناو کیفەکانیاندا دەمێننەوە پێی دەڵێن کوزر دووایە دەکوترێنەوە.

**کوزرەک** (هەمر.): پنجە گیایەکە هەمیشە شینە گەلای بەقەد لەپی دەستی پانە دەرووی وورد و تیژی هەیە لەبارێکی دا وەکوو مووی سپین، ــ بستێک بڵند دەبێ و پان دەبێتەوە لەتەلان و چراندا دەبێ، بۆ مارپێوەدراوان وورد دەکرێ لە نێو ماستیدا لە جێگایەکەی دادەنێن و

دەبیستن و هەموو ژەهرەکەی دەمژێ دەبێ لەپێش لێنانێدا جێگایەکەی کەمێک بکرێنرێ.

**کوزکەش:** گەواد، بێ ناموس، ژنحیز. ـــ ی: گەوادی، بێ ناموسی، ژنحیزی.

**کوژاندنەوە:** خەفە و خامۆشکردنی چرا، کوژاندنەوەی خەتی هەڵە و پاک کردنەوە.

**کوژاو:** کوژراو.

**کوژە:** کەویز، کەویچ ئەو بۆڕیە دارەیە لەسەر دۆڵیانەوە دانەوێڵەی پێدا دێتە خوارێ بۆ ناو گەرووی بەرداش.

**کوژەڵ:** پاک کردنەوەی جۆگەی گچکەی ناو باغ و بێستان.

**کوژتکار:** گۆشتفرۆش.

**کوژتن:** مراندن، کوشتن، (هەورا.) کوژتەی، لەگیان کردن، لەناوبردن، تێدا چوواندن، چراکووژاندنەوە، سەربڕین، لێدان.

**کوژتنگە:** خامۆشگە.

**کوژتـــن و بڕیـــن:** شـــەڕوناژاوە، نائـــارامی، زۆر بوونـــی تـــاوان.

**کوژران:** مردن بەگوللە یا بە تیغی یا بە لێدان، (لو.، هەورا.) کوژیان، لەنێوچوون، لەنێوبران.

**کوژراو:** پێکراو، کەسێکە بە خەنجەر یا بەدار یا بە گوللـە بـێ گیـان کرابێ.

**کوژنە:** کوژندە، بکوژ.

**کوژندە:** کوژنە، بکوژ، کووژێنەر، کاری، چتێکە هۆی کوژتنی گیانداریێ بێ.

**کوژێن:** کوژندە، بکوژ.

**کوژی** (باد.): قوژبن.

**کوژیار:** بکوژ، کوژەر، شێرکور، بە تەنها بەکارنابرێت.

**کوژیاگ:** هەویر، هەویر ترش. مردگ، مردوو. کوژراو.

**کوژیان** (لو.): کوژران، لێدران.

**کوژیانـــەوە:** خۆشـــیانەوە، شـــێویانەوە، هەڵپروشـــانەوە. کوژانـــەوە، خامۆشبوون، پاک بوونەوە، ئەستران.

**کوژیرک** (باد.): گۆشە، قولینچک.

**کوژین:** کوژتن.

**کوس** (کە.، هەورا.، باک.): قوز.

**کوسا** (باک.): چلۆن، چەجوور، چەنی.

**کوسان** (باک.): چلۆن.

**کوسپە** (باک.، باد.): نیوتروسکەدار.

**کوسک** (باد.): کوللـەی نێـو باغانـە، کـە کـەم دەفـڕن. (زا.) مـەردومی چاوشین.

**کوسکەش:** جاکێش، گەواد، دەویت، مەبەس لە کەسێکیە، کە کلکە سـووتەی بکـات بـۆ یـەکێکی دیکـە. ـــ ی: جاکێشـی، گـەوادی، کلکەسووتە، مرایی.

**کوسکوسانێ:** پانپانۆکێ.

**کوسکوسک:** ئەوکەسەیە زۆر چاو بترووکێنێ، چاوپرووش.

**کوسکێش:** بڕوانە: کوسکەش.

**کوسکێشی:** بڕوانە: کوسکەشی.

**کوسکی** (زا.): نووێڵی ئاسن.

**کوسۆک** (زا.): سەگ.

**کوش** (زا.): وورییایی، خۆپارازتن.

**کوشەر:** بکوش.

**کوشبوون** (زا.): هاتنە پێشەوە.

**کوسپل** (باک.): کشپەڵ، پشکەڵ.

**کوشەر:** هەڵکوشەر.

**کوشت:** لاش، لاشە.

**کوشتار:** سەربڕین. کوژتنی زۆر لە مەردوم یا لە گیـان لەبەران. لەشەڕی ئاراراتێ دا کوژتارێکی زۆرکرا، گۆشتفرۆشەکان دووێنێ، کوژتـارێکی زۆریان کردبو، کوژتاری گیان لەبەران، شەڕی خووێنی.

**کوشتارگە:** کوژتارگە.

**کوشتە:** گێچێکی گیراوەوەی کوژراوی بـێ هێزە لەسەر گێچی پـەوە سوواخی پێ دەدرێ بە ماڵەش لووس دەکرێ.

**کوشتەرا** (بابا.): جوورە ڕەندەیەکە دارتاشان داری پێ لووس دەکەن.

**کوشتەرە:** کوشتەرا.

**کوشتەی** (هەورا.): کوژتن، لەنێوبردن.

**کوشت:** کوشتن، کوژتن.

**کوشترا:** کوژرا، مرازی بوخاریست.

**کوشتران:** کوژران.

**کوشتراو:** کوژراو.

**کوشتکار:** قەساب. ـــ ی: قەسابی.

**کوشتن:** کوژتن، ئاژاڵ یا پارکوێرێکە بۆ سـەربڕین بـە خێـو بکرێـت. مراندن، بێ گیان کردن، بۆ لێدانی زۆر بەنازاریش بەکاردەبرێ.

**کوشتنەوە:** سەربڕینی مریشک و ئاژاڵ و تیتر.

**کوشتوو:** کوژراو، کوژراوەوە.

**کوشتی:** دابەستی، ئاژاڵێکە بۆ سەربڕینی بەخێوبکرێ. نەچیری کوژراو یا مرزی کوژراو.

**کوشک:** باڵەخانە. (بار.، کە.) دەلەک.

**کوشکەکردن:** کورش هەڵاتن، کوروورژم هەڵاتن.

**کوشکەلاتن:** کوروورژم هەڵاتن.

**کوشکەلاتوو:** کوروورژم هەڵاتوو.

**کوشکەلان:** کۆگای تەپاڵەیە، کـە بـەگردی دانرابێ و ناوەکـەی بـە بۆشـی مابێتەوە، سەرەنووێلک، سەرانگووێلک.

**کوشک هەلاتن:** کوروورژم هەڵاتن.

**کوشمە** (خۆ.، ڕەوا.): (بـار.) گوشـمـە، قـەزوان و مێـووژی کوتـراو، مێووژ یا کشمیشی کوتراو سەلک کراو و کوشراو بۆ خوواردن، قەزوانی تەنهای کوتراویش هەیە.

**کوشندە:** کوژندە.

**کرشمە**: کەپۆی فش بۆ مرۆ و مەڕو ماڵاتانە.

**کوشێن**: هەڵکوشین، ڕێک کوشین، گەرساندن، ووشین، ڕاگوشین، گڤاشتن، (هەورا.) ووشاردەی.

**کوشین بەدەشت**: داگژگژین.

**کوفت** (ئەردە.): کفت.

**کوفتە** (هەورا.): کفتە.

**کوفارک** (باک.): (باک.) کەوار.

**کوکو**: کورکور.

**کوکوختی**: باڵندەیەکە وەکۆتری دەچی، کە دەخوێنیّ دەڵیّ کوکوختی، ڕەنگیشی شینە.

**کول** (هەورا.، باد.): برین، زام، بەئێش، ژاندار، بریندار. کوّل، نەبڕ، کورە، سووار، کەرخ، تیغی کوّل. ـــ بوون. ساختە و بلۆف لیّدان. ئێش، ژان. چاوم کولە: چاوم دێشیّ. (فە.) کوولەکە، کەدوو. (باک.) کولک، قوونێر، قنچکە. (باک.) ئازار. ـــ اپیرۆزیّ: بەفرمشینە. (هەورا.) کورت، گوڵمیخ. خەفەتبار، دڵم کولە: دڵم خەفەتبارە. گیایەکە وەک خەرتەڵە بەڵام ئەم لووسە.

**کوڵ**: کوڵی گریانی، هەنیسک بەدەم گریانەوە. کوڵین، قوڵیان، جۆشی چتی. وە ـــ هاتن: (هەورا.) ئامانۆقوولّی. (فە.، کە.، بابا.) قوڵە، کورت، بۆ باڵندەی قوڵە و بیّ کلک دەبیّ. قوندە. (هەورا.) جلشوشتن.

**کولاپ**: قولاپ، چەنگاڵ، چەنگی گیاندار و باڵندە.

**کولابە**: قولاپە. دارێکی ئاڵقەیە لە نیری دەخریّ، ئەو دوودارەیە، کە دەخرێتە سەر ملی گاجووت.

**کولات** (زا.): کولۆی گچکە لەگڵ یا لە بەفر.

**کولاتگ**: چتێکە هاتبێتەکوڵ.

**کولاژدم** (جا.): دووپشک.

**کولاژم** (هەمە.): دووپشک.

**کولافە** (کۆ.): جەرگبڕاو، مرۆی بیّ وورە.

**کولافک** (باد.): کارگ.

**کولاف** (باک.): کڵاو، لباد.

**کولافک** (باک.): کارک.

**کولاک**: ڕەشەبا، باوبۆران، گەردەلوول.

**کولالەمار** (ئاک.): هەڵۆ.

**کولان** (ئەردە.): کولانە.

**کوڵان** (فە.): قەزوان، جۆشان، وەکوڵهاتن، پڵخین، (باک.) کەلمژین، کوڵین، پژان، پوختەبوون، پێگەیشتنی چێشت لەسەر ئاگرو وەجۆشهاتنی ئاو و شلەمەنی لەسەر ئاوور، (هەورا.) گریای، پرکین.

**کولانە**: ڕۆچنە، سووسە، دەلاقە، کولاوکە، کلاورۆژنە. جێگایەکی گچکەو سەرگیراوە مریشک و کۆتر و قەلەموون و مراوی و قاز و باڵندەی تری کەوی تێدا هەڵدەنیشیّ.

**کولانەوە**: هەرفان، کزانەوە، چووزانەوە، نارهان، ئاخیڤینی. ئازار بەبرین گەییشتن.

**کولانەی مریشکان**: کووخ، کۆلیت، کۆریب، پین، (باک.) قر، پینک، کۆلت، قنک.

**کولانچکە**: کلاورۆژنە.

**کوڵاندن**: جۆشاندن، کەلاندن، پوختەکردنی چت لەسەر ئاوور.

**کولاندنەوە**: هەرفاندن، کزاندنەوە، چووزاندنەوە، ئارهاندن، ئێشاندنەوە، وەئێشهێناندنەوەی برین بەدەست یا چتێک لیّدان، (باد.، باک.) برینیّ و ئاخیڤینی، برینیّ دەکولینێتەوە.

**کولانکە**: ڕۆچنە، کولینک، کلاورۆژنە.

**کولانگ** (باک.): قوڵنگ، (هی هەڵکەندنیّ). (ئەردە.) کوڵاندن.

**کولانن**: کوڵاندن.

**کولاننەوە**: کولاندنەوە.

**کوڵاو**: پەلوول، پژە، پوختە، ئاو یا چێشتێکە لەسەر ئاوری وەکوڵهاتبیّ و پوختە بووبیّ.

**کولاو** (لو.): تەوەرداس.

**کولاوەوە**: برینی وەژانهێنراوەوە.

**کولاورۆژنە** (بابا.): ڕۆچنە.

**کولاوکە**: ڕۆچنە.

**کوڵە**: ژیشک، ژووشک. چتی کوڵ.

**کولە**: جێگای خۆ لیّ حەشاردان لەمەردوم بۆ گوێگرتن و قسەدزین. فیسارەکەس ـــ ی لیّگرتوون. ـــ ی تەختی نوستنیّ: پەردە و سەر پۆشی تەختی نوستنیّ، مێشولەبەند، (باک.) پێشی بەند. کوللە، کولۆ، کلۆ، کووسک، کولب، شینایی دەخوا و زیان بە دەغڵی شین دەگەیەنیّ. چووارجوورە. ١) گەرد: تۆوەکەیەتی لە نێو کیفەکەیدا. ٢) پێکورە: بێچووە کوللەیە، کە تازە گیانی وە بەر هاتووە و زۆر وورده. ٣) کوللەیەکە باڵی لیّ هاتبیّ بەلاّن هێشتا نەفریّ. ٤) کەفری دەبێتە کوللە. (بار.) دوودارێ درێژە گیشەگیای پێدەبەستن و بەسەر بەفرێیدا ڕادەکێشن بۆ لای ئاوایی، کە شوێنەکە بلّند نەبیّ و ڕاست و تەخت بیّ.

**کوڵەباڵ**: فەرەجیەکی کورتی گوێچکەدارە قوڵ بەبن گوێچکەکانی دادەکریّ.

**کوڵەبالا**: کورتەبالا.

**کوڵەباڵە**: کوڵەباڵ.

**کوڵەبەراز**: قوڵەبەراز.

**کوڵەبەس**: منداڵی ژن لەمێردێکی تری.

**کوڵەبەست**: کوڵەبەس.

**کوڵەبرک**: کورتە دارێکە دەگیرێتە بەرزە درەخت بۆ خستنەخوارەوەی بەرەکەی.

**کوڵەبنە**: قوڵەبنە، تێکسرماو، کورت و قەڵەو، بانۆڵە، گرگن، (ڕۆژ.) کوڵەبالا، خرپلانە.

**کوڵەپرە** (ئەردە.): مەردومی خری چووارشانە.

**کوڵەپێچکردن**: ڕاپێچ کردنی یەکێک یا پتر چنگ لەسەرشان.

**کولەجە** (هەورا.): کەوا، کورتەک. (خۆ.) کورتەکێکی بیّ قوّڵە و درێژە، کولەنجە، کولۆجە، کەوای کورتی ژنانە. مرۆی کورتەبالا.

**کوڵەچووارشەمۆ**: چووارشەمووی هەرەدووایی مانگی سەفەرە، کە ددانی پێغەمبەری (د. خ) تێدا شکێنراوە.

**کوڵەخرتە** (ئەردە.): کوڵەپرە.

**کوڵەرِم**: رِمی گچکە، بەرچیغ.

**کوڵەزرک** (ئەردە.): سیقەتۆرە.

**کوڵەش**: کۆلۆش. مەردومی بێ شێوازو بێ ئابروو.

**کوڵەک**: نیسکی کوڵەک، نیسکێکە زووبکوڵێ و رِەنگ بداتەوە.

**کولەک** (باک.): رِەندە، لێسکەی کەوچک تاش. (باد.) پەنجەرەی گچکە، کە پەنجەرەی هەواییشی پێدەڵێن. (باد.) تاقی نێودیوار، تاقە.

**کوڵەکەوا**: دیرەگێکە درابێتە بەرنیرگە.

**کولەکەوا**: کورتەک.

**کوڵەکردن**: مەبەس لەگوێ رِاگرتنە بۆ قسەدزین.

**کوڵەکوێروو**: سفرەمار.

**کوڵەماڵە**: دارێکە ناوەرِاستەکەی کونێکی تێدایە زمانەی ئێرەقی پێدادەکرێ و ماڵەی زەوی پێدەدرێ.

**کوڵەمانگ**: مانگی شەعبان.

**کوڵەمەرگێ**: کوڵەمەرگی. گوزەرانکردن بە کەمی و کووڕی.

**کوڵەنان** (رِۆژ.): کوندەلاّن، جێگایەکە کوندەی ئاوی لەسەر دادەنرێ. ـــ ی (کە.): ئەفسوونگە، جادووباز، کوڵێنانی، پیاوێکە کەسێکی لەژنی بەسترابێ بیکاتەوە.

**کولەنجە**: کولەجە، کەوا، کولۆنجە.

**کوڵەنجەیی**: کولەجەیی.

**کوڵەنجی**: دورپشک.

**کولونگ** (رِەوا.): کولانە، رِۆچنە.

**کوڵەوەییب**: جوورە مارێکی کورتی زۆرپیسە، برێتیە لە مەردومی بەئاشوب، کوڵەوەیوار.

**کوڵەوەیوو**: کوڵەوەییاب.

**کوڵەوەیوای** (رِۆژ.): قاچپە، سووزانی لەکاتی جنێوپێدانێدا بەکاردەبرێ.

**کوڵهاڵ** (کە.): فەرەجی قوڵە و چکۆڵە.

**کولبوون**: نەمانی تیژی تیغ و مشار و هەموو جوورە تیغ و مرازێک. ماندووبوون لەکارێکیدا. (زا.) ئیشکردن. ئاوسان و کێم کردنی ئەندام.

**کولپ** (باک.): کوللە. (باد.) گرانی.

**کولپک** (باک.): کونی دوگمەیە.

**کولپیچ** (باد.): خشتی سوورکراوەوە.

**کولجە** (ئەردە.): کولەجە.

**کولخان**: کولخانە، توون.

**کوڵخانە** (کە.): تونگخانە، توون، کوڵخان.

**کوڵخانچی**: تونگخانەچی، تونگچی.

**کوڵخەن** (کە.): تونگخانە.

**کوڵخوواردن** (ئەردە.): جۆشخوواردنی چت بەسەر یەکتریدا مەبەس لە رِق هەستان و جۆشخوواردنی دەروون.

**کوڵدان**: جۆشدان و کولاّندنی چت لەسەر ئاوور. وەرِزیوون لەچتێک و دەست لێ هەڵگرتنی.

**کوڵژن** (خۆ.): بۆرِژن، گریانێکی پر سۆز و کەڵە و پرسەودایە.

**کولغا** (باد.): گیانداری زۆربرسی.

**کوڵفت** (ئەردە.): ئەستوور، زۆر.

**کولک** (بابا.، هەو.، رِەوا.): کولی، کووان، برین، قوونێر، (باد.) ژوورێکە لە حەسیر و قامیش دروستکرابێ. (بابا.، هەر.، رِەوا.، ئەردە.) دڵ بەخەم، پەرۆشدار، دڵی خەفەتبار. (باک.) پارچە، کوت، لەت، (باد.) کوول.

**کوڵک**: کوڵکە، مووی کورت، کەبۆ رِستن دەست نەدا. ـــ رِنینەوە. (باک.) کلاّوی شووانان. دوورچار، تووش: بووە بە ـــ یەوە واتە بووە بە تووشییەوە.

**کولکاپیرۆزێ**: بەفرەشینە.

**کولکانە** (لو.): ئەنگوستیلە.

**کوڵکە**: کوڵکەی خوری وورد و ئاڵۆز، کوڵک.

**کولکەبا**: ئەو قونچکە و قوونێرانەن، کە باوبژی ژوورەوەن دەری دەکات، قوونێر.

**کولکەپیرۆزە**: دەردەپیسە، (کۆ.) بەفرەشینە، بەورەشینە، کولکی سۆتنێ.

**کوڵکەر**: جلشۆر.

**کوڵکەردەیوو** (هەورا.): کورتکردنەوە.

**کوڵکەرِن** (کە.): کوڵک رِنینەوە بەدەست.

**کولکەسۆتنێ**: حەوتووێلکە.

**کوڵکەهەرەنگی** (هەو.): برینی کفتییە.

**کوڵکردن**: کالاّشتن.

**کولکردن** (زا.): پالّ پێوەنان.

**کوڵکریاوە** (هەورا.): کورتکراوە.

**کوڵکن**: تووکن، تووکاوی، چتێکە، کە کولک و تووک و مووی پێوەبێ. ماستاوی ـــ: ماستاوی خەستی کورِۆکورِۆ.

**کوڵکنە**: کوڵکن.

**کولکووات** (کرما.): کولونجە.

**کولکی سۆتنێ**: بەورەشینە، حەوتووێلکە، زیپکەیەکی بەژان و بەئێشە لە پێشدا سەری زەرد و بنی سووردەبێ تادێ گەورەدەبێ و دەرِزێتەوە چەند رِۆژێکی پێستی سمۆرەی لێ بنرێ چاکی دەکاتەوە.

**کولگە**: رِەبەت: جێ ی کۆبوونەوە و حەسانەوەی چەند رِاوچییەکە.

**کوللە**: کلۆ، کولی، کولۆ، کووسک، کولپ. بێچووە ـــ: پێکورِە، زۆر وورده و هێشتا باڵی نەگرتووە. پەردەی سەرپۆشی تەختی نوستنێیە.

**کوللەبەجەرِ**: مەبەس لە یەکێکی یە، کە ئەوەندە لاواز بێ ئەندامەکانی وەکوو بەجەرِ لێکدرابێ وایە. کوللەی تەختی نوستنێ.

**کوللەزەردە**: کوللەیێکی زەردی بەزیانە.

**کوللەک** (زا.): کلاّوڕۆژنە، شەل.

**کوللەمسکە**: جوورە کوللەییێکی ووردە گەنم و جۆی دەخوا.

**کوللێرەی شەکری**: سەووک.

**کولکی** (باد.): کوللە.

**کوللێرە**: ئەستوورک، (زاخ.) سەووک، ئەستووک، کوللی لووش.

**کوللێم** (باد.): کوللە.

**کولم**: کولمە، گۆنە، روومەت.

**کولم**: پەنجەی قونجاو. بڕ بەیەک دەست.

**کولمە**: کولم، (کە.) گۆنا، هنارک، گۆنە، (هەورا.) ئەلیک.

**کولمک** (موک.): نێک، کولۆک.

**کولن** (کە.): گۆنەقەڵەو، گوپن.

**کولنج**: ژانی شان و مل و پشتە بەهۆی سەرماوە. تووی نەگەییشتوو.

**کولند** (باد.، هەورا.، زا.): کوولەکە، کەدوو، (باک.) کولندر. ـــ امیرا: کوولەکەی ئەستوور.

**کولندر**: کوولەکە.

**کولنگ**: قولنگی ئەرد هەڵکەندنێ.

**کولۆ**: کلۆ، پارچەییێکی رەقە لەهەر چتێکی بێ: ـــ یەک قەند یا گڵ.

**کولۆ** (باد.): کوللە، کولە.

**کولۆپانە** (باک.): سەرەوژێر، پەرش و بلاّو.

**کولۆت**: کلۆک، کلۆت، (هەو.) منێک، گۆشتە ئەستوورایێکەی دەورەی قوونییە، کە مرۆ لەسەری دادەنیشی، هەندێکیش پێیان وایە، کە ئێسقانێکە نەرمەی گۆشتی سمتی پێوەیە، کولۆ.

**کولۆج**: ووتەیەکە بەکاردێنرێ لە دووای ووشەی بەهیچ رەنگێک.

**کولۆجە**: کەوا، کورتەک، کولەجە.

**کولۆخ** (باد.): کاسەی سەر، کەللەی سەر، کەبەبێ گۆشت و پێست بێ.

**کولۆر**: کلۆری ددان.

**کولۆز**: چتێکە، کە ناوی هولۆل و پووچ بێ.

**کولۆزرک** (ئەردە.): کولمزرک.

**کولۆش**: کلۆش لاسکی دەغڵی درواوە، (هەو.) قەسەل.

**کولۆشە**: کولۆش.

**کولۆفت** (ئەردە.، هەورا.): ئەستوور.

**کولۆفان** (باک.): خەمگین، پەرێشان.

**کولۆک**: نێهک، نێک، نێسکی سەرەوەی سمتییە. نۆکی ـــ: نۆکی کولەک، نیسک و نۆک و ماشی کولۆک. سمت.

**کولۆکار**: دیوارێکە، بە کلۆکرابێ، وەستایەکە، کە هەر دیواری کولۆ بتوانی دروستکا.

**کولۆکار**: چتی رێک و پێک.

**کولۆکاری**: خەریک بوون بە دیواری کلۆوە.*

**کولۆکۆ**: خەم و خەفەت، قولت و کول.*

**کولۆوکۆدامران**: سووتانی چت بە نێکجاری.

**کولۆکۆدامرانن**: سووتاندن و لەنێوبردن.

**کولۆکۆدامردن**: سووتان و لەنێوچوون.

**کولۆل**: کلۆل، مەردومی بەدبەخت، مەری نێوچاوان سپی.

**کولۆلۆ**: نووێ بووک.

**کولۆلی**: بەدبەختی، چارەڕەشی.

**کولۆم**: چەند پارچەدارێکە لە نێو کیسەڵەی دەرگایەدا بەرەت بوونی گۆڵە (شمشێرە) کە دەکەونە ناو لەڵەکانیەوە دەرگایەکە دادەخرێ.

**کولۆم کردن**: داخستنی دەرگا بە کلۆم.

**کولۆنجە**: کولۆجە.

**کولۆندە**: کولۆجە.

**کولوو**: لۆکەی تازەکراوەوەی نووالەکراو.

**کولووە**: خانوچکەی زۆر بچووک، ئەلەمد، گۆڕیچە.*

**کولووج**: جوور، تەرز، کلۆج.*

**کولووچە** (ئەردە.): کولیچە.

**کولووچەمەزگە** (ئەردە.): جوورە کولیچەیەکە ناوەکەی شەکر و گوێز یا خورمای تێدەکرێ.

**کولووچمار** (باک.): جوورە ماسیەکە.

**کولووخ** (باد.): کەللەی مردووان، کاسەی سەر.

**کولوور**: پێنج سەد هەزار یا پێنج لەک.

**کولوورە**: پوورەی هەنگ.

**کولووز** (ئەردە.): گیانداری پەڕپووتی بێ تێن.

**کولووزیانەوە** (ئەردە.): کورووزانەوە.

**کولوفت** (کەل.): ئەستوور.

**کولوفتی**: ئەستووری.

**کولووک**: نێوی ئافرەتانە. گوڵەکولیک.

**کولووک شووان** (بلبا.، ئاکۆ.): گەزیزە.

**کولووک ماست**: گوڵێکە بەپەیدابوونی وی ماست زۆر پەیدا دەبێ. کولووک ماست، بەهاری گێرا بەراست.

**کولووکۆ**: ئاگر، کڵپەی گڕی ئاوور. ـــ ی دامرکا.

**کولووکی** (ئەردە.): پەلەپەل و تاڵووکەکردن.

**کولوونیای** (هەورا.): کورت بین.

**کولێ** (باد.): کولووی بەفری، کوللە. (باک.): باکندەقوڵە.

**کولێر**: کون لە دیواردا، دەرییچە.*

**کولێرە**: مەزرەو، ئەستوورک، خەپلە، خەپلێ، مادە، لەواش، (کۆ.) نانی دەستی.

**کولێرە چەورە**: جوورە کوللێرەییێکە، کە ڕۆن لەڕوویەکی درابێ، کوولەکە دەرویش.

**کولێرەمەزگە**: جوورە کوللێرەیەکە ناوەکەی گوێزی کوتراوی تێکرابێ.

**کولێرێ** (هەورا.): کوللێرە.

**کولیمەک** (باک.): نێسکی سەرەوەی ڕانی یە.

**کولێن** (شاره.): شوێنێکی تایبەتیە لە نێو دەوارانـدا کـەل و پـەلی نرخداری تێدا دادەنرێت. (شار.) کوور، کەلێن، شارگە، پەناگـە، دا لّـدە، خەشیو، کولین.

**کۆلێنانی** (هەو.، کە.): جادووگەر، نزانووس.

**کولێنە**: کولانە مریشک، کولێن.*

**کولینک** (شار.): کولانە، ڕۆچنە.

**کولی**: ژان، نێش. چاو ـــ: چاوئێشە. (بار.، هەر.) کلووەبەفر. (هەورا.، باد.) کوللە، کاکۆڵ. (باد.) شەل. مرۆیەکی کارامەیە لە هەرکارێکی دا کەبیکات.

**کوڵیا** (فە.): کولاّو.

**کولیاگ**: چتی کولاّو.

**کوڵیان** (ئەردە.، فە.): کولاّن.

**کوڵیانەوە** (ئەردە.): کولانەوە.

**کولێرە**: ئەستووک، ئەستوورک، جوورە نانێکی خڕی ئەستوورە.

**کولیچە**: ـــ ی شەکری: هەڤریش. (هەورا.) هەویرەکەی بەڕۆن یا بە شیر دەشێلّرێ و لە نێو ڕۆنی دا سوور دەکرێتەوە جارجارە بادام و گوێزوکشمیشیشی تێدەکەن.

**کولیچەمەزگە**: کولّووچەمەزگە.

**کولیچێ** (هەورا.): کولیچە.

**کوڵی دڵ**: سۆزی دڵ، بەکوڵی دڵ خۆشم دەوێ.

**کولیر** (باد.): کوللێرە. کولیک: گوڵ، کولّووک.

**کولیک بووک**: کولیک پاقژ، پنجە گیایەکە چەند لکێکی دێنێ گەلاّی وەهی گووژاڵکی دەچێ گولی سوورە و لاسکی گوڵەکان زۆر درێژن و خاڵی ڕەشی پێوەیە لە نێوەڕاستی گوڵەکاندا زەردە.

**کولیک پاقژە** (باک.): کولیک بووک.

**کولیک جووانەمەرگ**: چڵەگیایەکی پاییزی یە و گوڵی سپیە و بنەکەی سەلکە.

**کولیک مەشک**: گوڵێکی کێوی زەردە لەسەر هەر گوڵێکیش دانرێ دەیکاتەوە، کولیک مێلاق.

**کولیک مێلاق**: کولیک مەشک، گوڵێکی زەردە و سووریشی هەیە گوڵەکەی بکوترێ لەسەر هەرجێگایەکی دانرێ، کەهەوای تێدابێ دەری دەکات.

**کولێک نیسان**: گوڵێکی سوورە وەکوو خاشخاشی وایە لەسەر هەر شوێنێکی لەش دانرێ دەیکاتە برین.

**کولیکولی** (باک.): شەلەشەل، بە کەمە شەلینێکەوە.

**کولیلک** (زا.، باد.): کولّووک، گوڵی دار و گیایان. (بابا.) کلاّوڕۆژنە، (شا.) کولینک، کولانکە، کولاوکە، ڕۆچنە، کولانەی دیواریشە بۆ ڕووناکی.

**کولین**: کەندووی زۆرگەورەیە و چوارگۆشەیە لەنێو ژووراندا، (ڕەوا.) خەشیو، (گەر.) خانووچکەیەکیشە شیروپەنیرو بەرخی ساوای تێدا ڕادەگرن، جێگایەکیشە لەنێو هۆیاندا بۆ بەرووبووم، لە چیغانی دروستدەکەن تا بەرچاونەبێ.

**کولین جۆ**: چەڵخووسی جۆ.

**کولیمک**: هەردووسمتی مەردووم.

**کولین** (ڕەوا.): کولاّنە. (باد.) موغەیری ئاوری. (باک.): تاقە، سرکۆ. هەرزاڵ. کۆترخان. شەلین.

**کوڵین**: (هەورا.) قولیای، کولاّنی شلەمەنی، پڵخین، (باک.) کەلین، کوڵین، وەکوڵهاتن.

**کولێن**: گۆشەییێکی ناوماڵ و یا دەوارە، کەمەشکە و هیزە ڕۆن و پێستە پەنیری لەسەر دادەنێن.

**کولینە** (خۆ.): کەندووی گەنم و ئارد و دانەوێڵەیە. (ڕەوا.) مرازێکی گچکەیە نێوکەوچکی داری پێ قووڵ دەکرێت. (هەورا.) کولاّنەی مریشکێ یە، کولێن.

**کولینج** (زەن.): قۆڵنج.

**کولینک** (ڕەوا.): کولانکە و پەنجەرۆکەیەکی گچکەیە لە بڵندایی دیواری دەگیرێ.

**کوڵینگ** (کۆ.): قوڵنکی گڵ هەڵکەندنی.

**کوم** (باد.): سەروپێچ. (باد.) ـ بوونەوە: کۆبوونەوە. (شکا.، باک.، زا.) کلاّوی درێژی لبادین، تەپلە.

**کوماتەک** (باک.): پارچەی کۆن، پەڕۆی منداڵ تێوەرپێچانێ، پەڕۆپاڵ.

**کومبر** (باک.): قوللەی سەرتەپۆڵکەی کێوی.

**کومتاق** (باک.): کەسێکە کلاّوی بەتەنێ لەسەربێ و پێچی تێ نەئالاّندبێ.

**کومرب** (باک.): زنجیری زێڕ، کرمەک.

**کومزەخ** (باک.): غار، ئەشکەوت.

**کوم زرە** (باک.): کومزری، عابا، عەبا.

**کومەا** (هەورا.): کاتی باران بڕان.

**کومسرە** (باک.): عابا.

**کومسۆر** (باک.): فێس، فێست.

**کومک** (باک.): کلاّوی شەوێ، نوختەی دوورایی، کومکاهاچی، یاجیلۆکا، کارگ.

**کومکەر**: دادخوواز، کەنۆ، کومکامر، داواکار.

**کومێد**: کومێت، کووێت.

**کون**: دەلاقەیێکی گچکە یا گەورەیە لە چتێکی. (هەورا.) وولّە. ـــ بوون: قوقڵین. ـــ کردن: قۆقلاّندن، قوول کردن، قولێزکرن. (باڵە.) کوندەی ئاوێ.

**کونی هەرەگەورە**: کۆلاو، قەوارە، کونی لە پردی دادیوە. وولاّخ. کونی لە پردێ داببینێ دەسڵەمێتەوە و ڕادەوەستێ، بۆ کەسێکیش بەکاردەبرێ، کە هەر چتێکی ببینێ ڕاوەستێ بەجنێو پێ ی دەڵێن لەپردی دا کونی دیوە.

**کونا**: کون، ڕۆچنە.

**کونار**: دارێکی درِاوی بۆ پەرژین دەست دەدات، تووترک، موور، (فە.) موورتک.

**کوناڕۆچن**: کوناوچە.

**کونارشک:** ئانیشک.

**کوناو:** ئەو چاڵە زۆر قووڵانەیە، کە لە نێو شاخاندایە ئاوی تێدابێ تا مرۆی کوژراویشی تێداوێن تا شوێن بڕێ.

**کوناوەجە:** کوناوەجگە.

**کوناوەجگە:** کوناوچە.

**کوناوچە:** کلاّورۆژنە.

**کوناودەر:** کونێکە لە هەر دووک دیوان دەربووبێ.

**کونە:** کوننە، کوندە.

**کوننە:** کونە، کوندە.

**کونەباجە** (رۆژ.، کە.، مامە.): رۆچنە.

**کونەبۆ** (کە.): کوندەبۆ، کوند.

**کونەکۆتر:** کۆترخانی خۆڕسک.

**کونەلاّن:** هەرزا ڵ، کەپرێکی بچووکە لە حەوشێدا لەسەر شرانە بۆ ئەوەی کوندەی ئاوو مەشکانی دژی لەسەر دابنێن، کە لە ماڵدابیت دەڵێن هەرزاڵە بۆ شتومەک لەسەرداانان دروست دەکرێ.

**کۆنەلاّنی** (کە.): جادووگەر، کولێنانی، کولەنانی.

**کون بەفر:** چاڵەبەفر.

**کونەبڕ:** شوێنێکە، کە با بووێری نەبێ. ـــ کردن: گرتنی کونی جێگایەکی، کە با هاتوچۆی پێدانەکا.

**کونبوون:** پەیدابوونی کون لە چتێکی، دەلاقەبوون، کون تێ بوون.

**کونج:** گۆشە، سووچ، قولینچک، قونجک، قونج، پەنا. دارا ـــ ی تەنیایی گرتووە. (کە.) جنجیر، مریشکی گونج، مریشکی جنجیر، خاڵدار. مرۆی گرۆێ. (بابا.) گونگە ئەو لوولە بۆریانە، کە بۆ ئاو لەژێر خاک دەنێن. گولّدان.

**کونجەو** (هەورا.): کونجی. ـــ ی: کونجی.

**کونجڕ:** ددانە وەکوو هی مشاری. چتی خاڵ خاڵ و کونجی. کونجوور.

**کونجڕاندن** (باک.): هەڵقورینجاندن.

**کونجرە:** درکی پەیکۆڵ، پێکوڵە، گیایەکی بەهاری و زبرە لە پێکوڵەی درکەکانی ووردترە.

**کونجرک:** نقوورچک.

**کونجرکە:** کونجرە، هەڵقورینجاندن.

**کونجرونجر:** ددانە ددانە وەکوو دەمی مشار.

**کونجرین:** هەڵقورینجاندن.

**کونجک** (هەورا.): قوژبن، قولینچک.

**کونجکلو:** کەسێکە، کە زۆر پرسیار لە چت بکات. ـــ ی: جووست و جۆ، بەپرسیار، بە شوێن چتێک دا گەڕان.

**کونجکوچێن:** یاری یەکە چەند کەسێک هەر یەکەی لە کونجێکی دا ڕادەوەستێ لە دووایی دا جێگە گۆڕکێ دەکەن لەو حەلەدا ئەگەر بۆیان ڕێک کەوێ لە یەکتری هەڵدەدەن.

**کونجوور:** کونجی تەسک و تەنگەبەر.

**کونجووڵ:** کونجوور.

**کونجی:** دانەوێڵەیەکە بە تۆو دەچێنرێ ساقی سەوزە ماڵات ناتوانی بیخوات، (باک.) کتاف، شەیدانک. قونجی تاوکەکەی وردو و زەردە وە هەرزنی دەچی. ڕۆنی کونجی بۆ سووتان باشە ڕۆنەکەی ئەگەر چل شەوان کەوچکێکی لێ بخورێ زۆر بەهێزە. کوندەببوو، چتێکی ووردی دەنک زەردی ناسکی چەورە دەکرێ بەکولێرە و بەگەلێ جۆرێ تر دەخورێ.

**کونجیت** (لو.): کونجی.

**کونجیلە** (هەورا.): گۆشە، قوژبن.

**کوند:** بەرچاوتەنگ. (باک.) تۆتک، تۆت، تۆتاک، (ئامێ.) بەم، بووم، کوننەببوو، کوندەبۆ، کوندەببوو، باڵندەیێکی گۆشت خۆری دندووک قولاپەی چاوجووانە هەر لە چۆلی و کەلاواندا دەژی، گۆیا لەسەر هەر ئاواییێکی بنیشێ شوومە. کوندەگا.

**کونداکۆر** (باک.): کوندەکوێر.

**کوندە:** کوندەی ئاوێ، کون، پێستی بزنە، کەبەساخی دەرهاتبێ و خۆشکرابێ، بۆ ئاوتێکردن. (هەورا.) قوندە، باڵندەی قوڵەیە. (شا.) پارچە کەرەستەیەکە کەوچکی پێ هەڵدەکەنرێ.

**کوندەببوو** (هەورا.): کوند.

**کوندەبۆ** (هەو.): کوند.

**کوندەلاّن** (ڕەوا.): شوێنێکە هاوینان کوندەی ئاوێ ی لەسەر دادەنرێت و بەگژ و گیا و قەلاّن دادەپۆشرێت لەبەرزی یە، کونەلاّن، کولّەنان، تاساردبێ.

**کوندڕ** (باک.): کولندر، کوولەکە. (کە.) شیو، خڕێکە ئاودڕبێتی، هەر شوێنێکی ئاودڕبێتی یا کونی کردبێ ـــ ی پێدەڵێن.

**کوندک** (باد.): کوولەکە، کوندە.

**کوندۆ** (ڕەوا.): پارگوێر، گوێلکی نێری دووساڵانەیە، کەندۆ، (کۆ.) مانگایەکە زۆر زوو بێ گوێرەکە شیربدات.

**کوندووش:** دەرمانێکە وەک بڕنووتی دەکرێتە لووتەوە بەلاّم ئەم توند و تیژتر و بە پژمەترە، سووژن، شووژن.

**کوندیتی** (باک.): بەرچاوتەنگی، کنووسی.

**کونڕۆڤی** (باک.): کونە ڕێوی.

**کونزەبین:** مەردومی تێنەگەیشتووی کەودەن.

**کونزووان:** مەردومی کڕی زمان لاّل.

**کونسارک** (بۆتا.): باکێش، شوێنێکە دژڵ و هەواکێش بێ لە هاویناندا.

**کونک:** گرێ یەکە لە نێو دارەگوێزێ داهەڵدەندرێ و دەکوترێ و چتی پێ زەرد دەکرێ. (باک.) تووکی ووردی باڵندانە. تەون. ـــ ا پیرێ: تەونی جاڵجاڵووکە.

**کونکەر:** سمتەر، سمکەر.

**کونکردن:** پەیداکردنی کون لە چتێکی، سمینی چت.

**کونگ:** قنگ، کونی پاشەوە، کاکڵی دار گوێز، کە بۆ ڕەنگ بەکاردێت، بێ هۆش، سڕ و تەزیو.

**کونگەم** (باک.): حەنبار، ژووری زەخیرە و دانەوێڵەیە.

**کونمشک** (باک.): کونەمشک.

**کوننە:** کوندە.

**كونۆش**: كوندوش، ڕژد و ڕەزیل.*

**كوننەی زرانی** (ئەردە.): كاسەی ئەژنۆ.

**كونۆشی**: مەردومی ڕژد، كوندووس.

**كونۆشە** (زا.): كەسك.

**كونووچكە**: كونی زۆر وورد.

**كونوور** (ئەردە.): كونووڕ.

**كونووڕ** (ئەردە.): جەوی یەكە، كە هی داری قەزوان نەبێ.

**كون و قوژن**: كون و كاژێر، پێچ و پەنا، كون و كەلێن.

**كون و كاژێر** (هەورا.): قون و قوژبن.

**كون و كەلێن**: پێچ و پەنا، فروفێڵ.

**كونەرچ** (باك.): كونی وورچی.

**كونیسك** (باك.): كەسك.

**كوهان** (باك.، هەورا.): گووان.

**كوه** (باد.): ئاڵبوونەوەی ددان. (باك.) كولبوونی تیغ، ددانی مـن ـــ بوونە: ددانم ئاڵبوونەوە.

**كوهدەرزی** (باك.): مەرزیلە.

**كوو** (باك.): كووێ؟. ـــ دەرێ: كووێندەرێ؟. چوو ـــ: چووەكووێ؟. (باك.) كە. (ڕەوا.) چۆن؟، چلۆن؟، (هەورا.) چەنی؟، (باك.) چەوا، چەوانێ.

**كووا**: (هەو.) كـانێ، كـا، (هەورا.) كـۆن، كووانـی، لەكووێیـە، لەكێندەرێیە.

**كووار** (شەم.): كەندووی دەغڵی، (هەورا.) كەنۆڵە، (باك.) كەوار.

**كووارە** (باد.): كەندوو.

**كووارگ**: كارگ، قارچك.

**كوواشە**: جێگایەكە بەراز لـە لێقـەومانێ دا، كـە چـەند سەگێك دەورەیان دابێ بۆ پارێزگاری قوونـی خـۆی تێـدە پەسـتێوێ تـا سـەگەكان لـە پشـتەوە هێرشـی بۆنەبـەن، جێگایەكە كەنداڵ یا بن پنچك یـا هـەر قولینچكێـك بـێ، (هەورا.) بێشە.

**كووان** (هەورا.): كوتـان. (هەورا.) دومـەڵ، (هەو.) كولـك، قوونێر، گرێیە، برینی پیس.

**كووانە** (فە.): كۆن.

**كووانگ**: ئاوورگ. (باد.) ئاوورگ، كووانوو، ئاگردان.

**كووانوو** (بابا.، كە.): ئاوورگ، ئاگردان، قۆرتـی ئـاگری، سـێپێ لـە ئاسن، سێكوچكە (كەبەردبێ).

**كووانێ**: كووا، كا، كانێ، كانی.

**كووانی** (دەر.): ئاوورگ.

**كووانی خورما**: برینێكی پیسە بە ئەندام هەڵدەپەرێ.

**كووانی كێش** (دەر.): خاكەنداز.

**كووەوە** (لو.): گۆڕیچە.

**كووای** (هەورا.): كوتان.

**كووە** (كە.): كەوا.

**كووپ** (هەو.، كە.، باك.، فە.): كووپە. لـە فینجـان گەورەترە چاو قاوەو ئیتری تێدەخورێتەوە.

**كووپان** (باك.): قۆپان، ڕۆچوون.

**كووپانە** (هەورا.): كورتان، كۆپان.

**كووپاندن** (هەورا.): (باك.) قۆپاندن، ڕۆچوواندن.

**كووپە**: دەن، كووپەڵـەی گـەورە، كەرگـە، كـەوار، كۆلێـن، كـووپ. ـــ ی ئاوی: لینە.

**كووپەدارینە**: بەرمیلی دارین.

**كووپەڵە**: كووپەڵۆكـە، كووپەڵـەی چكۆڵـە، دەرشـۆ، كـافك، كۆدینـە، كووپك. ـــ ی شین: كاشینكە.

**كووت**: شاری كـووت لەبنچینـەدا گـۆت بـووە و لـە (گـۆت) ی وەرگیراوە. زبڵ، پەین، خاك و خۆڵی ناوماڵ بەدەم گەسكەوە كۆدەكرێتەوە، كـە لـەگەڵ چێشـت و ووردەنـانی تێكەڵـە. ئەكرێتـە نـاو شینایی یـەوە بـۆ هـێزی زەوی ئەمـەش لـە شوێنێكی دا وایە، كەشیاكە و پشـكەڵ بسـووتێنرێ لـەبەر بـێ داری. ووشەیەكە سەگی پێبانگ دەكرێ.

**كووتا** (باك.): كۆتا. ـــ بوون: كۆتابوون.

**كووتاڵ**: كاڵای بازرگانی و بەززازان، كە جل و بەرگیان لێ دروستدەكرێ.

**كووتاڵفرۆش**: بازرگانێكە كوتاڵی بفرۆشێ.

**كووتاڵ وە رەش** (هەورا.): بازرگان، كوتاڵفرۆش.

**كووتان**: لێدان بەدار، ووردكـردن بـە ئەهێم، پەڕینی نێر لـە مێوینـە، گـان، دەرزی لێدانی ئاوڵە، دەرزی ئاژن بۆ خاڵ لـە پێست كردن، جۆری گاسنی دەم پان.*

**كووتە**: قەزوان و تووی بەیەكا كوتراو. (هەورا.) سەگ.

**كووتەڵ** (باد.): دۆڵیانی ئاش.

**كووتەڵە**: تووتكەسەگ.

**كووجی** (هەورا.): كۆڵانی تەنگەبەر.

**كووچاك** (زا.): خێزەرە.

**كووچە**: كۆڵان.

**كووخك**: كۆخە.

**كووك** (زا.): ئەژنۆ.

**كووتكووت**: كوتكوت، سەگی پێبانگ دەكرێ.

**كووتكووتە**: پارچە پەڕۆ یا گوشێكە منداڵان بەردێكی پێوە دەبەستن هەڵی دەدەن بە حەوادا.

**كووجی**: ڕاڕەوی تەنگ لەناو دوو ڕیزە خانوودا.*

**كووجیلە**: دەرمانێكە جانەوەری پێ دەرمان داو دەكرێ، گیای باقەیێن.*

**كووچ** (باك.): سنوور، تخووب، كۆمابەرد. (هەر.) كـوچ، كووچكووچ، سەگی پێبانگ دەكرێ.

**كووچە**: كۆڵان، چێلەكەل، ئالوولە، كووچەی چكۆڵە، ڕێكۆك.

**كووچەڵە** (كە.): جووچكەی سمتی. (كە.) كۆجەڵـە، كاسەی چكۆڵە.

**كووچك** (فە.، دەر.): سەگ، ئاوورگ.

**کووچکووچ:** کووچی کووچی، کوتکوت، کوو تکووت، سەگی پێبانگ دەکرێ لە دوورەوە، واروار.

**کووچی کووچی:** سەگی پێبانگ دەکرێ.

**کووچیلە:** دەرمانێکی چۆلەکە کوژتنییە لەگەڵ گەنمی تێکەڵدەکرێ.

**کووخا:** کوێخا، (لو.، فە.، لک.) سەرۆکی هۆبەیەکیە لە کەیخودا گچکەترە.

**کووخک** (باد.): کۆخە، کۆکە.

**کوخکی** (باک.): کورخن، ئەوکەسەیە بکۆخێ.

**کووخیان** (باک.): کۆخین.

**کووخیاندن** (باک.): کۆخاندن.

**کوخین** (بابا.): کۆخین.

**کوودە** (هەورا.): ئەسکوێ. (لور.) کۆدە.

**کوودەری:** جوورە کرێکە جل و بەرگی لێ دروستدەکرێ، جوورە چەرمێکی تایبەتیشە سەری پێڵاوی لێ دروستدەکرێ.

**کوودەڵە:** بڕەک، (ڕەوا.) بزڵەبەراز، (هەورا.) بێوەڵە، بەچکەی بەرازی. بۆ بێچووە بەراز و وورچ بەکاردەبرێ.

**کوودک:** ئەژنۆ، زرانی، بێچووی لاور، کوتک.*

**کوور:** سەرەولێژ، سەرەوخووار. (ڕەوا.) هەورازێکی سەخت وەکوو دیواری، مرۆخۆی کوورنەکاتەوە ناتوانێ سەرکەوێ. بڵند و نزم، ڕێگا لە ـــ دایە: بڵند و نزمە. کۆم، کۆفر، پشتکوور، قەنبوور، پشتقۆف، چەماوەوە، قۆقرکۆم، پشتخووار، داهاتوو، خار، خورز، هیس، (شوا.) کورکن.

**کوور:** (دەر.) سابروون، (هەورا.) سابرین. گیسکی نێری دووساڵانەیە، بزنی مەرەز. جڵەوبەستنەوەی وولاخ. (ڕەوا.) شوێنی تەلەزگە وەکوو قەراخی گەلی، هەڵدێر، کەوور. ـــ بوونەوە: لە هەڵدێرێ خۆ ئاوێژتن، نقەچوون، تەکەربوون، خۆ بەردانەوە. ـــ کردنەوە: فڕێدان، ئاوێژتن، بەردانەوە، تەگەرکردن، هەڵدان. قووڵ، قوور. (فە.، دەر.) کوێر، خامۆش. ـــ کردن: کووژاندنەوەی چرا. (باک.) کورت.

**کوورانگ:** کارگ، کارچک.

**کووراهی:** قولایی.*

**کوورە:** کەلەبەرێکە لەزەوی یا لەدیوار ئاگری تێدا دەکرێتەوە. چتێکی کونکونی پێچکدارە لەتەنەکە یا لە گلی سوور وەکراوە ئاگری تێدەکرێ و چێشت و چای لەسەر لێدەنرێ.

**کوورە:** قوت، سڵ، مەڕو بزنی گوێ چکۆڵە، سوور لەسەر مەبەست و دڵگەرم لە دزیدا.*

**کوورە:** دەمە، ترمووش، کوورەی ئاسنگەران، دەمگا. کارێز.

**کوورەپەزخانە:** کوورەی خشت سوورکردنەوە.

**کوورەچێتی:** پیشەی کوورەچیان.

**کوورەخانە:** تونگخانە، (هەورا.) توون، کوورەپەزخانە.

**کوورەدان:** پوورەدانی هەنگ.

**کوورەدەمێن:** شاگردێکە، کە بە مووشە دەمە هەر کوورە بدەمێنێ.

**کوورەڕێ** (باک.): کوێرەڕێ، ڕێگایەکە دەرنەچێ.

**کوورەفەرەنگی:** جوورە کوورەیەکە بە نەفت داییسێ و چێشت و چای لەسەر لێدەنێن.

**کووربوون** (ڕەوا.): لەجێگای بڵندەوە کەوتنەخوواری.

**کووربوونەوە:** داچەمان، داچەمین، کۆم بوونەوە، چەمانەوە، چەمیانەوە، داهاتنەوە.

**کوورکردنەوە:** کۆم کردنەوە، چەماندنەوە، چەمیاندنەوە، خووارکردنەوە، چۆماندنەوە، فساندن، داهێنانەوە، داچەماندن.

**کووڕنج** (باد.): پەرەکەر، هەڵلاج.

**کووڕێ** (هەورا.): کوورە.

**کووریس:** پەزی سووری گوێ کوڕ.*

**کوورین:** قوورە قوور.*

**کوو:** چلۆن، چۆن، چاوان، کام چێ، چیا، کێو، کێف، کە: (کرە ئەڤهابت).

**کووز:** سووچ، گۆشە، ئەم دارە سێسووژە واتە ٣ کووزە. (هەورا.) جۆگەلەیە. (سوور.) ئەم دارە سێسووە واتە سێکووزە. (ڕەوا.) قەوزە. (موک.) قاش، تیلم، (دەر.) کوویز، (کە.) دیلم، قاشی کاڵەک و شووتی و ئیتر، تاش. (باک.) گۆزە.

**کووزانەوە:** چوورزانەوە. نوورزانەوە، کروورزانەوەی منداڵان.

**کووزاندنەوە:** چوورزاندنەوە.

**کووزە** (زا.): گیاندارێکە بەقەد پشیلەیەک دەبێ کلکی درێژو چوواریەلی کورتە، پێستەکەی دەکرێ بە کەوڵ.

**کووزەڵە:** چ خۆی بخورێ و چ ئاوەکەی بۆ میزگیرانی زۆرباشە، گیایەکی بەهاری و تونەدی ئاوییە گوڵی سپی و وردە، گەڵایەکانی کەمێک وە کەرەوزی دەچێ تامی وەهی تەرەتیزەی دەچێ.

**کووزەکە** (باڵە.): برینی چاویلکەیە.

**کووزین:** پرووزانی مووی پێست.*

**کووزک** (باک.): گۆزەڵە.

**کووزماڵ:** جۆماڵکردنی دێراوی ئاوباخ و جۆگای ئاوە.

**کووزکردن:** قاش کردن.

**کووزکووز:** چتێکە هەر لە خۆیەوە قاشقاش بێ، قاشقاش.

**کووزلێدان:** خانخانکردنی زەوی بە گاسن بۆ دێراو و گۆل.

**کووزی** (باک.): پارچە.

**کووزین** (باک.): لووراندن، حەپاندن.

**کوژ:** پاشگری بە واتا، بکوژ، پیاوکوژ.*

**کووژانەوە:** دامرانەوە، خامۆش بوونەوەی ئاوور و چرا و ئیتر، تەمرین، خەفەبوون، دامرکان، دامران، ڤەمرین. لەنێوچوون، ڕەشبوونەوە، هەشفین.

**کووژاندن:** کووژاندنەوە.

**کووژاندنەوە:** تەمراندن، کولووشتن، خامۆش کردن، دامرکاندن، دامراندن، نەهێشتنی گڕی ئاگر و چرا، ڕەشکردنەوە و تێکدانی چتی نووسراو یا دیغی سەر زەوی. ڕەشکردنەوە، ڤەمراندن، هەشڤاندن، تێکدان، لەناوبردن. نەهێشتنی شلووقی و ئاژاوە.

**کووژاننەوە:** کووژاندنەوە.

**کووژاو:** بە کوشت چووگ. *

**کووژاوە:** خامۆش بووە، نووسینێکە ڕەش بوویێتەوە.

**کووژە** (باک.، شکا.، شەم.): دەڵەک. ئەوکونەیە، کە دەغڵی لێدێتە خوارەوە بۆ ناو کوێرەووی بەرداشی. (خۆ.) کرووژم. ـــ کردن: کرووژم هەڵێنان.

**کووژەر:** کوژیان، بکوژ، کووژەوە، کووژین.

**کووژەرە** (ئەردە.): عەنزەرووت.

**کووژەکە:** دوگمەیەکی شینە بۆجوانی لەسەرشانی منداڵان دەدروێ، (هەو.) لەپکە.

**کووژەکەکەرانە:** مووررووە کەرانە.

**کووژەوە:** کوژیار، کوژەر، بکوژ، سەربڕ.

**کووژک** (باد.): دەڵەک.

کووژک

**کووژێن:** کووژەر، بکوژ.

**کووژێنەر:** بڕێنەر.

**کووژێنەرەوە:** کووژێنەوە.

**کووژێنەوە:** کووژێنەرەوە.

**کوس:** تەپڵی گەورە، دەهۆڵ.

**کووسا** (باک.): چلون، چلۆن.

**کووسان** (باک.): چلۆن.

**کووسە** (باک.): چلۆن. کۆسە.

**کووسەل** (باک.): کیسەڵ، (باک.) کووسی.

کووسی

**کووسی** (باک.): کیسەڵ.

**کووش:** کوێ؟، چ جێگایەک؟. لە ـــ بوویێت: لەکوێ بوو بێت. هیچ، چوو.

**کووشە** (خۆ.، ڕەوا.): لکی مێوێکی یە لەبن زەوی دادەبەن سەری لە دوورەوە دەردەخەن نێو قەدی لە ژێر خاکدا ڕیشە دادەکوتێ دەبێتە مێوێکی سەربەخۆ و بەریشی لە هی مێوی دی زۆر باشترو خۆشترو پتردەبێ لەپاش یەکدووساڵاندا لکەکەی لای داری پێشوو دەبڕن.

**کووشک** (باک.): گیایەکە. (هەو.) گووێ ی جەواڵی یە، دەستگرو هەنگڵی جەواڵی یە.

**کووف** (باک.): کووڕ، کۆم.

**کووفتە** (هەورا.): کفتە.

**کووفک** (باد.): ڕەحەتی نەفت و چتی تر.

**کووفکوف** (باد.): مرقەمرقی بەرازییە. ـــ ا بەرازێ.

**کووفێن** (باک.): فیتوولێدەر.

**کووفی** (باک.): سەرپێچی ژنان، کوولەە.

**کووفین** (باک.): فیتوولێدان.

**کووڤ** (باک.): ئاخوڕ، (باک.) کۆل.

**کووڤان** (باد.): ڕق، پشوو، پشم، کین، قین، دەرد، دەردی دڵ، دەردی بێ دەرمان، پەرۆش، خەم، خەفەت، داغ و خەفەت، ئێش و ئازار. ـــ دار: دەردەدار، خەمبار. ـــ داری: دەردەداری، خەمباری.

**کووڤە:** کەی؟.

**کووڤی** (باک.): کێوی، ڕەمەکی.

**کووکە** (دزە.): دەدرێکی مریشکانە. (ڕەوا.، خۆ.) بۆ دەرکردنی کەڵەباب بەکاردەبرێ دەڵێن کووکەکووکە. (باک.) ڕەحەتی. (کۆ.) بێ چاوەڕوو، بێ ئابڕوو، بێ شەرم. ئاوری بنکایە. (هەورا.) کۆخە. هەراو ئاژاوەییێکە بەهۆی چتێکی ناشیرینەوە ڕوویدات. قووقەی کەڵەشێر.

**کووکەکووک:** کۆخەکۆخ.

**کووکن** (شوا.): کۆم، کووڕ.

**کووکوو** (هەورا.): کووکی. (ئەردە.) جوورە کۆترێکی دەنگخۆشە.

**کووکووختی:** جوورەکۆترێکە.

**کووکووکەرە:** کۆترەبارێکە.

**کوول** (هەو.، باد.): زام، برین، بەئێش، ژاندار. کول، نەبڕ، سووار، کەرخ، تیغی کول. (وان.، ئارا.) بەندە، بەنی. تەختەیەکە وەکوو سندوق نانەوا هەویری تێدا دەشێلێ. (ئەردە.) فیلی شەترەنج. زاخە. (ئەردە.) ئەشکەوت. (باد.) تەویلە.

**کوولایی:** قووڵایی.

**کوولە** (کە.): خورییەکە شۆرابێ و کرابێتە لوول.

**کوولەبا** (باد.): قوونێر، (هەورا.) دوومەڵ.

**کوولەک** (باک.): ڕەندە. (بار.) کولانە، ڕۆچنە. (باک.) شەل، لەنگ.

**کوولەکە:** (هەو.) کدوو، کودی، کوولەکێ، کولندر، (باد.) کوندک، کریتی، قوندک، (شەم.) کولند، (ڕەوا.) کەدوو، (بار.) کوندڕ، بە پیشاوی بەیانی بخورێ لە خورێنی کرمی پێ فڕێدەدرێ. لە ـــ ی تەڕیش دا ئاریان نەماوە.

**کوولەکەباڵقەباغی:** کوولەکەیەکی ملدرێژە ناوەکەی دەردێنن چتی تێدەکەن.

**کوولەکە دەروێشی:** جوورە کوولەکەیەکی بنخڕی ملبارێکە دەروێشان ڕۆنی سووا لی تێدەکەن، گیایەکیشە لە نێو دەغڵی دەڕوێ بەرێکی وەکوو کوولەکەی دەگرێ بەڵام ئەم ووردە.

**کوولەکە دۆشاوی:** جوورە کوولەکەیەکی شیرینی سوورە و دەکرێ بەچێشت.

**کوولەکەدەمە:** جوورە هەنجیرێکە لە هەرمێ ی دەچێ.

**کوولەکەسەندەلی:** جوورە کوولەکەیەکی گەورەی سەرخڕی قاشقاش دەکرێ بەچێشت.

**کوولەکەی ئاوی:** جوورە کوولەکەیەکی چکۆڵەی بارێکی سپییە.

**کوولەکەی ووشک:** کەلێز.

**کوولەکێ** (هەورا.): کوولەکە.

**کوولەکێن** (ئەردە.): چێشتی کوولەکە.

**کولەمەرگی** (بابا.): مەمرەمەژی بۆ خواردنێک بە کاردەبرێ، کەزۆرکەم و ناڕێک بێ.

**کوولک:** کولانەی مریشک.

**کوولکوول** (باک.): جوورە باڵندەییێکە. (باک.) کوولانک.

**کوولی:** قوولّی، کووری.

**کوولیر** (سوور.): قوونێر.

**کووم:** کلاّو، وشەی پرسیار، واتا چۆنم؟، قنگ، پۆپەی کەڵەباب، مەلّکی بچووکە. *

**کوون** (هەو.): ڕەشماڵ، کوویّن. (کە.) قوون.

**کوونە** (لو.): مەقەڵی.

**کوونبەتاڵ** (بۆتا.): بێوەژن.

**کوونێتی:** حیزێتی، قوندەرێتی.

**کوونێر** (باک.): قوونێر.

**کوونی:** حیز، قووندەر، بلّح، پوشت، تەنبەڵ، بێکارە.

**کووە** (ئەردە.): ئەستێرەی کۆ.

**کوویّ:** (هەورا.) کۆ. (هەو.) کێندەریّ، چ جێگایەک، (دەر.) کوورە. بۆ ــــ دەچی: ئەرا کوورەچی؟، کەوەچی؟. بۆ ــــ: کۆگە، کاندا، کوویّ، کێندەریّ، کێوە؟، لەکوویّ: چکۆ، جەکۆ، لکور، لە ــــ وەدێی: (دەر.) لەکوورەوە دیای.

**کووی:** چۆنی، چلۆنی، چەوای، چاوای.

**کوویە** (فە.): کێو.

**کوویّت:** وولاّخێکە ڕەنگی سوورێکی تاریک بیّ یا سوورێکە بە زەردی بروانی، ئەسپەکوویّت، (باک.) کومێت، کومێد، ڕەنگێکە لە ڕەنگەکانی چارەویّ بە سوورێکی جەرگیدا.

**کوویّتی:** شۆخی، بۆ ئافرەتان بەکاردەبرێت. ڕەنگێکی سوور و زەردی تێکەلاّوە بۆ وولاّخی بەرزە بەکاردەبرێت.

**کوویّخا:** خاوەندماڵ، دەمراستی ئاغای، کۆخا، کەیا، برا گەورەی ئاوایی، کلیت، (هەورا.) قێخا، (گەل.) کەڤۆخوویّ.

**کوویّخادەرک:** سەردەرکەوان، سەرپەردەدار.

**کوویّخاژن:** ژنی کوویّخا.

**کوویّخانە:** کوێخا ئاسایی. *

**کوویّخایانە:** مووچەییّکە دەدریّ بە کوویّخا.

**کوویّخایەتی:** کوویّخایی.

**کوویّخایی:** دەمراستی، کاربەدەستی دێیەک.

**کوویّر:** شەڤرەشکی، نابینا، ئێتتۆن، (هەورا.) کۆر، (دەر.) کوور، بیّ چاو، کەسێکە تاکێک یا هەردووک چاوی نەبینیّ. ــــ بوون: کوویّرایی داهاتن. دەشت و بیابانێکە ووشک و بیّ ئاو و گیابیّ. گوویّزێکە ناوکەکەی بەکاکڵ دەرنەیەت.

**کوویّرا:** (کۆ.) کێرا، چ زوو. لەکاتی سەرسوورمانیدا بەکاردەبرێت. ــــ ئەو پەرتووکەت تەواو خوویّند: واتەچ زوو.

**کوویّرانە:** وەکوو کوویّران.

**کوویّراو:** کەمئاوێکی بۆگەنە، چاوگەیەکە کەمی ئاو لەبەر برۆات. کەند یا کانییەکە ئاوەکەی ووشک بووبیّ. ــــ ی: گەنداوی، ووشکاوی.

**کوویّرایی:** چاوسپی بوونەوە، لێلاّیی، کوویّراوی، کوویّری، کۆرایی.

**کوویّرایی داهاتن:** کوێربوون، سۆمایی داهاتن.

**کوویّرە:** کۆرە، لەکاتی بانگ کردنیّدا بەکاردەبریّ. (کە.) کوویّرووی دەخڵی، فیشەکێکە نەتەقیّ.

**کوویّرەدیّ:** دێیەکی گچکەی کەم ئاوە، کە چەند ماڵە هەژارێکی تێدابن.

**کوویّرەریّ:** ڕێگایەکی باریکە، کە هاتوچۆی کەم پێدابکریّ.

**کوویّرەک:** کوویّرەی دەغڵی. (کە.) کوویّرە، فیشەکێکە نەتەقیّ.

**کوویّرەکانی:** کانییەکە لە بەهاراندا بتەقیّ و لە هاوینیّدا ووشکبیّ یا ئەوەندە ئاوی نەبیّ، بەهارەکانی، کانییەکە، کە پڕبووبێتەوە ئاوێکی کەمی مابیّ. ناوی دێیەکییە لە سووررداش.

**کوویّرەمار:** سەفرەمار، (هەو.) کۆرەمار، جوورە مارێکی کوویّری کوژندەیە، قوڵەوەیاب.

**کوویّرەمشک:** مشکەکوویّرە.

**کوویّرەمووشە:** مەردومی چاوکز.

**کوویّرەوەبووگ:** کوویّربووەوە.

**کوویّرەوەبوون:** کوویّر بوونەوە.

**کوویّرەوەری:** (هەورا.) کۆرەوەری، ئازار، ڕەنج، ڕچ، سەخڵەتی، چەرمەسەری، دەردەسەری، دەردەسەری لە کاروباردا.

**کوویّرەوبوون:** کوێرەوە بوونی بیروکانی. کوێربوونەوە. *

**کوویّربوون:** نابینابوون.

**کوویّربوونەوە:** نەمان و بزربوونی ڕیّ و شوویّنی چتێکی، نەمان و بنبڕبوونی وەچەی یەکێکی.

**کوویّردڵ:** مرۆی تیّ نەگەیيشتوو.

**کوویّردڵی:** کەم ژیری، زەین کوێری. *

**کوویّرزەین:** بیر سستی، کەم ژیری. *

**کوویّرک:** کوویّرووەی نێو دەغڵی. کوویّرۆک، (هەورا.) وەزەکۆر، کوورک، گوویّزی کوویّر، گوویّزێکە بە کاکڵ دەرنەیەت.

**کوویّرۆک:** گوویّزی کوویّر، کەبەکاکڵ دەرنەیەت، کوورک.

**کوویّرکوویّرانە:** بەنابەڵەدی، بەناشارەزایی، بەبیّ لێکدانەوە.

**کوویّرنان:** کەسێکە نان بدە نەبی.

**کوویّروو:** کۆرک، کوویّرە، کووڕی، گورگە، کوورک، کوویّرەک. دەردێکە بگاتە دەغڵی کاکڵی دەنکەکانی دەکاتە خۆڵەمێش.

**کوویّرهۆش:** هۆش سست، کەم هۆش.

**کوویّرهۆشی:** هۆش سستی.

**کوویّرێتی:** کوویّری.

**کوویّری:** کۆری. کوویّروو.

**کوویّریشک** (هەو.): کەروێشک.

**کوویّزر:** بروانە: کۆزر.

**کوویّژرک** (باد.): قوژبن، قولینچک.

**کوویّژکە** (کە.): چۆلەکە، کوویّژیلە.

**کوویّژیلە:** چۆلەکە.

**کوویّسان** (هەورا.): کوویّستان.

**کووێستان:** کوورێسان، زۆزان، ساردەسێر، هاوینەوار، کێووستان. ـــ ی: کوورێسانی، ساردەسێری.

**کووێسەڵ:** کیسەڵ.

**کووێشتێر:** چتێر.

**کووێشکە** (هەو.): چۆلەکە.

**کووێکە** (دەر.): کۆخە.

**کووێن:** کەون، کۆن، سیپاڵی شرویپس، پەلاس، تاوڵ. دەوار، ڕەشماڵ، تەختەی دەوار، پارچەی دەواری. جلکی تازیەداری، بەرگی شین، شیوەن. ـ لەبەر: ڕەشپۆش، مل بە کووێن.

**کووێنە** (کە.): کۆنە. (کە.) ـ یی: کۆنەیی.

**کووێندەر:** کووێ، کێندەر. ـ ی: ئازاد کووێندەرییە؟.

**کووێنەدەرێ:** کووێ، کێندەرێ، کوێ، کۆگە، چ جێگایەک. کوودەرێ، چێرێ.

**کووینەک:** تەختەیەکە، بەشێکە لە دارەوار، کووینک.

**کووێۆ:** کووێ.

**کووێوە:** لە چە جێگایەکەوە؟

**کووێووسان:** کوورێستان.

**کووێویەسان:** کوورێستان.

**کووی** (هەورا.): کێوی، ڕەمەکی.

**کوویت** (باک.): زاد، زەخیرە، ئازۆخە.

**کوویتان** (باک.): فیتوولێدان.

**کوویر** (باد.): قووڵ.

**کوویتاندن** (باک.): فیتولێدان.

**کوویز** (دەر.): کووز.

**کوویزە** (ڕایەت): لاپانە قووڵەکەی جگییە. (باک.) ئارد.

**کوویسان:** کوورێستان.

**کوویسەڵە:** کیسەڵەی دەغلی.

**کوویسک** (هەورا.): گسک.

**کوویش** (باک.): پشوودرێژی. ـ کرن: ددان بە جەرگی خۆداگرتن.

**کوویکە** (کە.): کۆخە.

**کووین** (باد.): کووێن، ڕەشماڵ، دەوار. (شار.) چەکوچی گەورەی بەرد شکاندنییە، ماوەر.

**کووینک:** تەختەیەکە لە دەوار.

**کووێنە:** کووێ.

**کووێی:** کێوی.

**کێ:** چکەس؟، کێ؟. ـ یە: چکەسە، پرسیارە بۆ دیاری کردنی باری تاکە کەسێک: کێیە؟، کێ بوو؟، ـ دەڕوا؟. (شوا.) کا.

**کێبار** (باک.): بارەکەو.

**کێبر** (باک.): پارچەدارستان یا پاوانی سووتاوە. کورتکراوەوەی کێرد بڕییە.

**کێتات** (باد.): ئەو دارەیە بەنێو ڕایەڵی تەونی دادێنن و دەیبەن.

**کێتک** (باد.): پشیلە.

**کێچ:** کەکی، (کە.) کەک، (هەورا.) کەکەیی، قێچ، چێچ.

**کێچاتی** (باک.): کچێنی.

**کێچەڕەشکە:** داعبایەکە بێستان و شینایی دەخوا.

**کێچک** (باک.): بەبەڵەی چاو.

**کێچ کەوتنە کەووڵ:** بریتییە لە پەل پێکەوتنی یەکێک.

**کێچووک** (هەورا.): گووێ، گووێچکە.

**کێچ هەڵێنان:** مەبەس لە تاڵووکە پێکەوتنی کەسێکی، کە جێگایەکی بەجێ بێڵێ.

**کێخا:** کوێخا.

**کێخوا:** کوێخا.

**کێدان** (دەر.): کادان، کادێن.

**کێر:** چتی کاڵی نەگەییشتوو. (فە.، دەر.) کاریلەی ساوا. چوو، کیر، قامیشی پیاوان، ئەندامی شەرمی نێرینان. (هەکا.، باک.) سوود، قازانج، کەڵک، کا. بکێر هاتن: بەکارهاتن. (هەکا.، باک.) زنجیرەی کێوان، ملەکێو. کەوە، جغزی خڕ، هێڵ، خەتی کێشراو لەسەر زەوی یا قاقەز.

**کێرا:** چ زوو، کووێرا.

**کێرات** (باد.): سینگە ئەستوورەکانە، کە بۆ تەونی بەکار دەبرێن. داری ئاوریشمی کێوییە، کە کەزۆکی پێدەڵێن، دووبەژن بڵند دەبێ گەڵای ڕەشە و تووکی زەردەو بەری وەک فاسولیا وایە ناخورێ، کەژ، (باد.) کێرۆکە، دارکەژۆک.

**کێران** (زا.): داری درێژی نەگەییشتوو.

**کێرەفیل:** مەبەس لە قامچی هۆنراوەیە، کەلەدەست دەکرێ.

**کێرەکەڵەگا:** کیرکەڵەگا.

**کێرەموول:** کیری ڕەشەوولاغ و ئاژاڵانە.

**کێربڕ** (باک.): کێردبڕ، چتێکە چەقۆ بیبڕێ.

**کێرخۆر:** مەبەس لە ئافرەتی کێرخۆر و جۆشنە.

**کێرد:** چێر، چزلک، (هەورا.) چزلیە، کێرک، جەخار، کێر، کارد، کێلد. کێردی بەرخەنجەرێ دەسکدارە و ئانوشتێتەوە.

**کێردگەر:** کێردکار، کێردساز.

**کێرزل:** مەبەس لە مەردومی زۆردارە.

**کێرزلی:** زۆرداری.

**کێرسم:** شێوی مرۆڤ.

**کێرک** (باک.): قەڵەمبڕ، کێردی گچکە.

**کێرکەر:** کارەکەر.

**کێرکەڵە** (ئەردە.): گیاکەڵە.

**کێرکەڵەگا** (مەرک.): (کۆ.) بێ ڕێ، گیایەکە لە لاسکی تووتنی پەیدا دەبێ، لەناوی دەبا.

**کێرکچێکەر:** چەقۆساز، چەقۆکەر. ـ ی: چەقۆسازی.

**کێرکچی:** چەقۆساز، کێرکچێکەر.

**کێرمیز:** کەرمیز، شوورێنەوار.

**کێرنەگرک** (باک.): سووسەمار.

**کێرۆکە** (باد.): کێرات، داری ئاوریشمی کێوییە تادوو بەژنان بڵند دەبێ و گەڵای ڕەشە و گوڵی زەردە و بەری وەکوو فاسولیا وایە و ناخورێ، داری کەژۆکی.

**کێرووشک** (خۆ.): کەروێشک.

**کێرووشکەکردن:** بڕوانە: کەروێشکەکردن.

**کێرهاتن:** بەکارهاتن.

**کێری** (هەو.): کێلی. (باک.) پۆپەی کەڵەبابە، قوللە. (باک.) مەشکەژەن، مەشکەژێن. (بار.) چیای بەردین.

**کێریشک** (باد.): کەروێشک.

**کێرینگرک** (باد.، باک.): قومقومۆکە..

**کێز:** ژاندنی مەشکە. (باد.، زێ.) جوورە قالۆچەییێکە، گوخلێنکە.

**کێزان:** ژەندنی مەشکە. ـــ دن: ژەندنی مەشکە.

**کێزە** (باد.): قالۆچە.

**کێزەر:** گێزر. ـــ ی: گێزەری.

**کێزر:** کەسێکە لە کاروکرداریدا هەڵەشە بێ و بە خودسەری کاربکات. پنجەدارێکی سەوز و کورتە، پنجک.

**کێزری:** هەڵەشەیی و خودسەری لە کاروباردا.

**کێزک** (زا.): کێز.

**کێزم:** تاقەدارێکە، کە مێوێکی خرابێتە سەر.

**کێزمە** (زێ.): بەرچیغ. (زێ.) سینگ یا دارێکی کورتە وەبەر مێوی دەدرێ. بەندارێکی باریک و پەل بڕابێ، کە لاقی وێ کەوێ بریندار دەکات.

**کێزێن:** لوولەییێکە بۆ ئاو بەژێر زەویدا برابێ.

**کێزی:** جاڕوو.*

**کێژکە** (خۆ.): چۆلەکە، (ڕەوا.) کێژۆولە، بەهەموو باڵندەیەکی چکۆلە دەڵێن.

**کێژوولە:** چۆلەکە.

**کێس** (زا.): کەس، کیس. (باک.) پەسند، خۆش و ناسوودە.

ئەڤ جە بێ ـــ ە: پەسندنیە.

**کێستەک** (باک.): گڵمەت، کەستەک.

**کێسک** (باک.): زیندەوار، (باد.) گەسک.

**کێسکڤان** (باد.): گەسک لێدەر.

**کێسین** (باک.): لوولە، بۆری.

**کێش:** ڕەشتی تەواتایی، لە ـــ ی مندانیە. سەنگ، سەنگینی، دەمپەڤری، تەرازۆ، نۆرەیەک لە چتی بە تەرازوو کێشاو: ئەمە چوار یا پێنج کێشە. کشان، کێشانە. (هەورا.) شەدەی ئاوریشم، مشکی. وەزنی هەڵبەست. بە ـــ: گران، شایانی کشان. مشکی بەپێزە: ئەم هەویرە بەکێشە، ڕا، بەڕشت. تەرازوو، شایەن.

**کێشان:** قوم لە جغارەدان یا لە سەبیلە و نێرگەلە. ڕاکێشان، خرکاندن، خشاندن، ڕاکشاندن، (باک.) دەڤتین، (هەورا.) کێشیای. ئەندازەگرتنی چت بەسەنگ و تەرازوو. پەڕاندنی وولاخی نێر لە هی مێیینە. چت بە تەرازوو کێشان، ڤەکێش، سەنگاندن، (کە.) کێشانە. جەوروجەفا هەڵگرتن (قبول)، ئازارکێشان، چرووساندنەوە.

**کێشان:** خاپاندن، خاواندن، وەدرەنگ خران، کشکشاندن.

**کێشانە:** کێش، بەتەرازووکێشان، ئەندازەگرتنی چت بەسەنگ و تەرازوو.

**کێشانەکردن:** کێشانە.

**کێشانەوە:** دووبارە سەنگ کردنەوە. هێنانەوە دوواوەی چت، ئاورەکە یا وولاخە بکشێنەوە.

**کێشاندن:** کشاندن.*

**کێشانن** (ئەردە.): کێشاندن.

**کێشە:** ووشت و مڕ، گاشە، کێشمەکێش، کەشاکەش، گەڕ، قڕە، قڕڕە، جەنگ، سەربەندۆ، بنار، پیلە، گێچەڵ. ـــ کردن: بەزراندن، بەلشین. ماڵگوێزتنەوە. (جا.) گوێزتنەوەی دەغڵی درواوە بۆ سەرخەرمان. (هەورا.) باربوو. (باک.) دەرکە گچکەکەی نێودەروازەیە. ڕێز، پۆل.

**کێشەر:** کێشندە.*

**کێشەکێش:** کەشاکەش، نیخەنیخ، قرەقر، کەشمەکەش، هەراهەرا، بگرەوبەردە، بگرەوبکێشە، قرتەقرت، هەراوهووریا، هەراوکێشە، جڕەجڕ، هەلاهەلا، جرتەجرت، کێشمەکێش. تێکەولێکە، معاملە.

**کێشەمان:** ڕاکێشان، گوشین. ـــ دان: ئازاردان.

**کێشەوە:** (هەورا.) کێشە، گوێزتنەوەی چتێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

**کێشەوبەرە:** کێشەکێش.

**کێشەوێ:** کێشەوە.

**کێشران:** ڕاکێشران، خرکێن، کێش هاتن.

**کێشراو:** کشاو، سەنگاندراو، بەرانبەر، تەراز.

**کێشک:** ئێشک، پاس، (دەر.) هێشک. ـــ کردن: پاس کێشان، (هەو.) باربوو، (باڵە.) پارازک.

**کێشکە** (کە.، هەو.، دزە.): چۆلەکە.

**کێشکچێتی:** پاسەوانێتی، پەهڤانی، ئێشکڤانی.

**کێشکچی:** پەهڤان، دیدەوان، دیدەڤان، یاساوۆڵ، ناتور، ناتورڤان، (باک.) کێشکڤان، پاسەوان، پایە، چەرخچی، ئێشکچی. ـــ دووایی: دووران.

**کێشکردن:** ڕاکێشانی چت.

**کێشکڤان** (باک.): کێشکچی.

**کێشک گرتن:** ئێشک گرتن.

**کێشماکێش** (ئەردە.): کێشمەکێش.

**کێشمان:** کشان و فراوان بوونی چت، فانیلەکە ـــ ی دێ: دەکشێ.

**کێشمەکێش:** کێشەکێش، دەردەسەری، بگرەوبەردە.

**کێشندە:** هێزێکە لە هێندێک چتدا هەیە چتی تر ڕادەکێشی بەلای خۆیدا.

**کێشواکێش** (ئەردە.): کێشمەکێش.

**کێشوەر**: وڵات.*

**کێشوولە** (خۆ.): چۆلەکە.

**کێشهاتن**: درێژبوونەوە، کشان، لێک کشانەوە، کێشمانی چت.

**کێشی** (باک.): بار.

**کێشیاگ** (ئەردە.): کێشراو.

**کێشیان**: کێشان.

**کێشیای** (هەورا.): کێشان، کێشین.

**کێف** (کۆ.): کێو، چیا. (هەمە.) کێو، شاخ، کەژ، کەیف، خۆشی، شادی. ــ اتە: بەکەیفی تۆبێ. ــ دن: شاد و دڵنیاکردن. ــ امن ژێ تێ: ئەوەم پێ باشە. ــ کرن: خۆشرابواردن.

**کێفار**: گیایەکە چڵ چڵ هەڵدەستێ بەکۆمەڵ سەری هەر چڵەی گوڵێکی تۆپ دەردەکات تووکن و سپییە نێرتکیشی هەیە و دەخورێ، (باد.) کێڤار.

**کێف**: ئاگرپژێن.

**کێفە**: کەژ، کێو.

**کێفخووەش** (باک.): کەییفخۆش.

**کێفرۆشک** (زا.): کەروێشک.

**کێفزاڵ** (زا.): قرژاڵ.

**کێفزاڵە** (ئاک.، زاخ.، باد.): قرژاڵ.

**کێفسار** (ئەردە.): کێوسار.

**کێفسان** (ئەردە.): کێوسان، کوێستان.

**کێفش** (زا.): چتی ئاشکرا و نمایان.

**کێفکی** (باد.): چتی بۆگەن.

**کێفی**: کێوی.

**کێفیلە** (باد.): کێویلە.

**کێفریشک**: کەروێشک.

**کێڤی** (زاخ.): کووپەڵۆکە، ئامانێکی گڵینەیە رۆن یا هەنگوینی تێدەکرێ.

**کێک** (فە.، هەورا.): کێچ، (هەورا.) کەک. جوورە خواردەمەنیەکە لە هەویر و هێلکە و شەکر و رۆنی پەیدا دەبێ ورێک دەخرێ.

**کێکەف**: تیروو، دارێکی کوێستانییە، بۆ دارتاشی زۆر جووانە.

**کێکوو** (ئەردە.): کێکەف.

**کێل**: بڵند، بەرز، قیت. ــ بوونەوە: بەرزبوونەوە. ــ کردنەوە: بەرزکردنەوە. نوختە، نتک، جێگا. ــ ەک خستن: نوختەیەک دانان. دووبەردەپان و درێژو قیتەکانی لای سەرینگان و پێ یینگانی گۆڕانە. (کە.) تاوێری سەرگۆڕ، لە کوردستانیدا کێلی لە بەردە مەرمەڕی سپی و لووس و بڵند دروست دەکرێت، کەبە گەردنی ئازداران دەڵێن گەردن کێل هەر لەوانەیە بەو هۆیەوەبێ. (هەورا.) کەیەل، میلی رەنگا و رەنگی بەرە، (ئەردە.) کێل. کیلە بۆ پێوان.

**کێڵ** (هەورا.): کۆلیت.

**کێڵان**: هەڵگێڕانەوەی زەوی بە گاسن، زەوی هەڵدڕین، زەوی بە گاسن هەڵکەندن، خەوراندن، (باک.) خەورکرن، جووتکردن، کالان.

**کێلان**: کالان، بەرگی خەنجەر وشیر.

**کێلانە**: کێلان. (هەورا.) کەلانە.

**کێلە** (ئەردە.): کەوێژ، پێوانە، کەویچ.

**کێلەبەردانێ**: یاریەکی دوودەستەییە هەر دەستەی چەند کەس بن، دەبێ ئەوەندە تەنکە بەردی بچووک بەقەد دەستێک ئامادەبکەن دەستەیەکیان بەردەکانیان دەچەقێنن دەستەکەی تر تەنکەبەردەکانی تێدەگرن.

**کێڵەر**: زەوی کێڵ.

**کێلەک** (باک.): کەلەکە، لاتەنیشت.

**کێلەندی** (زا.): جۆرەداسێکی گەورەیە بەهەر دوودەستان دەگیرێ و درووێنەی پێ دەکرێ.

**کێلد** (باک.): کێرد، کارد.

**کێڵدان** (زا.): دروومان.

**کێڵران**: جووت لێکران.

**کێڵراو**: شووێنێکە، کە کێڵرابێ.

**کێڵریاگ**: کێڵراو.

**کێلک**: دانە بەردی سەرشاخ و کێو. (باک.) پێستی تەنکەلە نێوخوری ئاژاڵاندا. (زا.) کەلەکە.

**کێڵگە**: مەزرا، زەوی جووتی، زەویەکە دەست بدات بۆ جووتی، زەوی کێڵراو.

**کێلۆ**: ژنی فەلە. کێلۆ کێشێکە بەرانبەری ۱۰۰۰ گرامییە.

**کێل و پێل** (باک.): کەل و پەل.

**کێلووک** (باد.): ژنێکە پسووڵمان نەبێ.

**کێلوون**: ئاسنێکی زمانەدارە لەدەرگای سندووق دەدرێ و بەکلیل دادەخرێ.

**کێلێ** (هەورا.): گەمە، یاری، گاڵتە، گەپ.

**کێلی**: بار، مەزوو، هەو، کێو، چیا. (باک.) دەم، کات. ــ کەدەن: دەمێکی دی.

**کێلژە**: کۆڵەکەی چارداخی تووتن.

**کێم**: چرک، زووخاو، نێم، زوخ، زنجکاو، هەوای برینان، ئاداب، هەو، (مامە، باڵە.) ئاداب، زلزڵە، کێماو، برانگوە، هەوایەکی سپییە لەبرین و قوونێران دێت، خوورێنی گەراوەوەی خەستی سپی برینانە. (باک.) کەم.

**کێماسی** (باک.): کەماسی، کەم و کووڕی، ڤیان، کەمایەسی.

**کێمانی** (باک.): کەمایەسی.

**کێماو** (کە.): کێم، هەوا، کێمی روون.

**کێماهی** (باک.): کەم و کووڕی، کورتی، کەمایەسی، کەمی.

**کێمایی**: کەم و کورتی.

**کێمەبەر**: تەنینەوەی برین بە هۆی کێمەوە.

**کێمتر**: کەمتر.

**کێمترین**: کەمترین.

**کێمجاڵە:** قرژاڵ.

**کێمخوا:** پارچەیێکی ناسک و نرخداره لەچەشنی کری ئاوریشم و ئەتلەسی وایە.

**کێمخووار:** بڕوانە کێمخووا.

**کێمختیە:** کەپەکی ئاشی.

**کێمدار:** هەوادار. ـــ ی: هەواداری.

**کێمکەتی** (باک.): بەدبەخت.

**کێمکردن:** پەیدابوونی کێم لەبرین.

**کێم و خوێن:** گڤاند، شڕ، شڕی.

**کێم و کیسی** (باد.): کەم و کورتی، کەم و کووڕی.

**کێمی** (باک.): کەمی، کەماهی.

**کێن:** ئەوان کێن و چەکەسن؟. ئەوان نێویان چیە؟.

**کێندەر:** کووڕێندەر. ـــ ی: کووڕێندەری.

**کێنی** (دەر.): کانی.

**کێو:** کۆی، کۆه، (هەورا.) کۆ، ماه، (فە.) کاو. چیا، کەژ، کەش، کێلی، بەن، کێف، پشتخووار، (فە.) کەمەر، زنجیرەی کێوان: سەفان.

**کێومالْ:** کەدز یا جەرده لە کێوێکی خۆی حەشاردابێ یا هەرجووره گیان لەبەرێک لەنێو چیایاندا بێ سەروشوێن و گوم بووبێ دانیشتووانی هەموو گوندەکانی دەوروبەر و نزیک تێکڕا بۆی دەردەچن و هەموو کون و کەلێنی کێوەکە یا کێوەکان دەپشکنن تا سۆراخی دەکەن و دەیدۆزنەوە.

**کێوە:** بۆکووێ، بۆکووێندەرێ، (هەورا.) کۆ.

**کێوەست** (ڕۆژ.): پەتێکە وەکوو پێوەند و کۆتە دەکرێتە هەر دوودەستی گووێدرێژانەوە.

**کێوەلی** (کە.): سەماکەر و کۆچەر و گەڕیدە.

**کێوپارە:** کۆسار، کێووستان.

**کێوسار:** شوێنی شاخاوی.

**کێوسان:** کوێستان.

**کێومـــاڵ:** هەرەوەزێکە بەگەل بەنێو کێواندا لەچت یاکەسی ونبووداگەڕان.

**کێووز** (باک.): گووێزی کووێرۆک، کە کاکڵەکەی دەرنەیەت، (هەورا.) کۆروو.

**کێووژ:** کەریژ.

**کێووستان:** کۆسار، کێوپارە، کوێستان. ـــ ی: کوێستانی.

**کێووک** (بار.): (شار.) دارکوتکە، (کۆ.) دارکۆرینە، باڵندەیەکە.

**کێووڵکانێ** (هەورا.): پێشبرکە.

**کێوی:** کووی، (ڕەوا.) سڕ، شاخی، کۆیلە، ڕەمەکی، هۆڤ، کۆڤی، کووڤی، هەڵە، ئاکەوی، ڕووێل، جۆو، بۆ ڕووەک و گیانداران دەستەدەدا، واژی کەوی و ماڵی. سڵ، بۆ مەردومی سڵ و سرک دەستەدەدا.

**کێوی ئاگرڕژێن:** کێوی ئاوورین، کێوی ئاوور وەشێن، چیای ئاگرین، چیای ئاوور ڕژێن.

**کێوی ئاوور ڕژێن:** بڕوانە: کێوی ئاگر ڕژێن.

**کێویلە:** سەوزایی و دارو درەختێکە، کەلەدەشت و کێواندا ڕووابێ و بەدەست نەچەقابێ.

**کێها:** کام؟، کامە؟، کێژان، کیشک، کێژک. ـــ نە: کامەتا، کیشک؟، کیژک، کامیان.

**کێهایان:** کامیان؟، کامەیان؟.

**کی** (باک.، فە.، لو.): کێ.

**کیار:** بێستانی کاڵەک و شووتی و ترۆزی و خیار و بامیە و باینجان و تەماتە.

**کیارک** (باک.): گیایەکە.

**کیاسەی** (ژا.): ناردن.

**کیاستە** (هەورا.): ناردەمەنی. ـــ ی (هەورا.): ناردن.

**کیاستن:** ناردنی یەکێک بۆ شووێنێک، هەناردن، ڕەوانەکردن.

**کیال** (باک.): جحێلْ، لاو، گەنج، کاڵ.

**کیالْ** (هەورا.): گەمە، یاری، گاڵتە.

**کیانا** (هەورا.): ناردن، هەناردن.

**کیانان** (هەورا.): ناردراو.

**کیانای** (هەورا.): ناردن.

**کیانەی** (هەورا.): ناردن.

**کیاندن** (کەل.، زەن.): ناردن.

**کیپ:** کپ، خامۆش، مات. ـــ بوون: کپ بوون. ـــ کردن: کپ کردن. (باک.) ڕاست، دروست. گووێ ـــ بوون: گووێ کپ بوون و گیران، پەرخ بوون.

**کیتەڵە** (موک.): دیزەیەکی گچکەیە لە گڵەسووری دروست دەکرێ بۆ چێشت و ماست بەکاردەبرێ، سیتلۆک.

**کیخ** (باک.): شەپۆلی درێژ و کشاو، شەپۆلێکە درێژ ڕاکشابێ.

**کیر:** سیرەت، قەمیش، قامیشی نێرینان، ئەندامی شەرمی نێرینان. (بابا.، کە.) کێر، چوو. ـــ ی منداڵان: (باک.) چوچ. ـــ ی ووڵاخ و ماڵاتان: شووارِ. (باد.) کێردوچەقۆ.

**کیراکی** (باک.): یەکشەمە.

**کیراهە:** کرێدان.

**کیرە:** جووره دەنگێکە لە وێک کەوتنی هێندێک چتەوە پەیدادەبێ، کرڕە.

**کیرەپ** (باک.): کەشکەک.

**کیرەپسانە** (هەو.): گەمەیەکە.

کیرەشک

**کیرەسەیانە:** فسەگورگانە.

**کیرەشک** (باک.): پەرواز، چووارچێوە.

**کیرەکیر:** کرڕەکرڕ.

**کیرەمووڵە:** کیری ڕەشەووڵاخ و ئاژاڵانە.

**کیرەی ئاسنگەران** (فە.): کوورەی ئاسنگەران.

**کیرکافر:** فارزک.

**کیرکەڵەگا** (موک.): کەڵـە، (کۆ.) بیّ ڕێ، چلە گیایەکە لـە ڕەگی توتن و هاروێ و تەماتەی پەیدادەبێ و ووشکی دەکات و لەنێوی دەبات.

**کیرنج:** (هەو.) پەرەکەر، هەڵلاج.

**کیریسک** (باک.): پریشکی ئاووری. کیری وولاّغ و مالاّتان.

**کزێن** (باک.): هاتنەخوار، ڕەوان بوونی ئاوونیتر.

**کیژ:** کچ، کەنیشک، دۆت، (ڕۆژ.) تە. (باک.) گازندە، گریان، قیژە، ناڵین.

**کیژان** (باک.): کێها، کامەیان.

**کیژک** (بۆتا.، باک.): دەڵەک، (شیر.) کوشک. (باک.) کێها، کامە.

**کیژکۆک** (بار.): کژێ، کیژێ، کمکمە.

**کیژۆڵە:** کچۆڵە.

**کیژووکار** (ڕەوا.): کچی عازەب، گەورەکچ، بۆ کچی گەورە و چکۆڵەش بەکاردەبرێت.

**کیژێ:** کچێ، کیژکۆک.

**کیس:** جێگایەکە لە لەش کە ــ و بلۆق بکات. ــ ی ددانان: بلۆقی پووکە. کیسە. ــ ی مێشکی: کیسکی مێژی.

**کیسە:** کیسەی پارە: جانتا، توورەکەیەکە چتی تێ بکرێ. ــ ی گەورە: جۆرک، توورەکە.

**کیس :** چرچ بوون.

**کیسەبڕ:** گیرفانبڕ، دز. ــ ی: گیرفانبڕی.

**کیسەتەماکۆ:** کیسەتوتن.

**کیسەتوتن:** کیسە تەماکۆ، چاڵمە.

**کیسەکێش:** ناترێکە لە گەرماوێدا بە کیسەیەکی تایبەتی خەڵکی بشووا.

**کیسەکێشان:** هێنانی کیسە بەلەشی مرۆڤیدا بۆ خاوێن کردنەوەی لەچڵک.

**کیسەڵ:** کوسەڵ، کووسی، کوویسەڵ، کیسۆ، داعبایەکە لە چۆلی دەژی وەکوو ڕەقەی نێو ئاوێ وایە.

**کیسەڵە:** کۆترەی گۆڵەی دەرکێیە، ئەو دارەیە، کە بەدەرکەوە قایم کراوە و شمشیرە (گۆڵە) ی دەرکێی تێدەخرێ و گاڵە دەدرێ. دارێکە مازە و لاجامە پێکەوە دەنووسێنێ. کوویسەڵە لە مێش گەورەترە، زیندەوارێکە وەکوو سنی وایە زیان بە دەخڵ و دان دەگەیەنێ وەکوو کیسەڵی وایە بەلاّن بەقەد نینۆکێکییە و پێی زۆر ووردە و باڵیشی هەیە گەفی لەناو دەبات.

**کیسەلەمل:** مەبەس لە کچی جووانکیلانەیە.

**کیسەوزەڕێ** (هەورا.): کیسەی پارە.

**کیسە و کەمەر:** جوورە کەمەربەندێکە چەند کیسەیەکی پێوەیە چتی تێدەخرێ.

**کیسە هەڵدروون:** مەبەس لە چاو لە دووبوونی یەکێکی بۆ چتێک دەڵێن فیسارەکەس کیسەی بۆ هەڵدرووە، واتە چاوی لە دوویەتی.

**کیسک:** کیسە. ــ ی مێژی: کیسەی مێشکی. ــ ی نووزێ: مێزدان.

**کیسکردن:** سەرهەڵدانی کیسە لەژێر ددانانا. برێتییە لە پیشخوواردنەوەی کەسێکییە لەڕقان.

**کیسۆ** (باک.): کیسەڵ.

**کیس و فس** (باک.): گیایەکە.

**کیسی ددان:** (هەورا.): کیسی دان.

**کیش:** (شاەکیش)، شالە کاتی ڕاونانیدا لەشەترەنجێدا. ئایین، دین.

**کیشک** (ڕەوا.): کێها، کامەیان، بۆ پرسیارە.

**کیشوەر:** وولاّت، خاک. ــ ی کوردستان: وولاّتی کوردستان.

**کیشوەرگیر:** وولاّتگر، وولاّتگیر. ــ ی: وولاّتگری، وولاّتگیری.

**کیف:** ــ ی پارە: کیسە، چەرمێکی دووتوویی هەڵدرووراوە هەندێ چتی تێدەخرێ، بەرگ، خلێف. ــ ی هەنگێ: جانتا. چتێکە لە قاییش دروستدەکرێ یا لە پارچە کالاّیەکی ئەستوور بۆ دەمانچە و تفەنگ و ئیتر تا لە توزێیان بپارێزێ، سیلاهی. بەرگ خلێف.

**کیفاندن** (ئەردە.): ووشاندن، ووشەکردنی مار، فیکەکردنی مار لەکاتی شەڕێدا.

**کیفانن:** کیفاندن.

**کیفە** (کە.): ووشە و کیفەی ماری، فیکەی ماری. فیشاڵ، گوڕڕە.

**کیفەکیف:** ووشەووشی مار و کیسەڵ.

**کیفکردن:** هەڵکفانی چت.

**کیفن:** چتی هەڵکفاوی پفەڵ.

**کیفۆک:** پیفۆک، پیشۆک.

**کیفار** (باد.): کرێژی سەری کەچەلاّن.

**کیفی** (باد.): گیانداری کێوی.

**کیک** (باد.): کووکی.

**کیکیکیک:** (فە.) قووقاندنی کەلەباب.

**کیلە:** پێوانەییێکە چووارتەنەکەیە، پێوانە، ڕبە، کەویج، کەویژ، کێل ئامانێکە چتی شلی پێ دەپێورێ.

**کیلەرک** (باد.): گەنجینەی ژووری.

**کیلتە** (باک.): خیز، ووردەبەرد.

**کیلۆ:** کێشێکە هەزارگرامە.

**کیلێل:** ئەنبار، ژووری دانەوێڵە، کیلێر.

**کیم** (هەورا.): کێم، هەوا.

**کیمکیم** (باک.): دەم، هەرەت، کات، گۆنەر.

**کیمیا:** زانیارییێکە باسی دروستکردنی هێندێ چت ئەکا بە لێکدان بە لێکنان و جووایەزکردنەوەیان، دروستکردنی زێڕ و زێو بە دەرمان. زانستێکی ناسراوە بەزمانی فەرانسەی شیمی پێدەڵێن. پیشەی پارە و دراو دروستکردن. گیایەکە بنەکەی کوڵکە وەکوو بنی گلێخەیە سەلکەکەی دووای ووشک کرانەوەی دەکرێتە توز بۆ برینان زۆرباشە.

**کیمیاگەر:** دراو دروستکەر، کەسێکە سەری لە هونەری کیمیا دەربچێ. ــ ی: پیشەی پووڵ و دراو دروستکردن، سەر لە هونەری کیمیا دەرچوون.

**کیمیایی:** کیمیاگەری.

**کین:** قین، ڕق.

**کینە:** ڕق. ــ دار: ڕقدار، قیندار. ــ اری: ڕقداری.

**کینەکێش**: کەسێکە کینەی زۆربێ لەگەڵ مەردوما.

**کینەکێشان**: ڕق کێشان لە دڵ لە یەکێک.

**کیندار**: قیندار، ڕقدار.

**کیوار**: گیایەکی بەرزی کوێستانیە و بەهارییە گەڵای وەکوو بی وایە بە کوتراوی دەدرێ بە وڕلاخی بەرزە. جوورە جیوەیەکیشە لەلا قەدی کیوار پەیدا دەبێ دووای بریندارکردن و دووای مەیینی وەک بنێشت دەخورێ.

**کیوون**: پیک.

# گ

**گ**: تیپێکی تابێی کوردییە. هەموو، گشت، تەواو، بەڵام بەتەنێ بەکارنابرێ، وەکوو: گرۆژی: هەموو ڕۆژێ.

**گا**: نێرەی مانگایە، گاو. جێگەیە ئەگەر بەدوای وشانەوە بنووسێ، وەکوو: کارگە. کات، زەمان.

**گابەرە**: (کە.) گاشەبەرد، بەردی گەورە.

**گابەڵەک**: چۆلەکەیەکە.

**گاسک**: (باک.) لوویەکە لەبن گووێی گای دێ.

**گابۆڕ**: شین و گریان و هاوار، شیوەن.

**گابۆڕدان**: تێهەڵکردنە گریان.

**گاپەل**: کۆتری کێوییە.

**گاپیل**: (هەورا.) سەرو شان و مل گەورە.

**گات**: (باک.) بەش، پارچە، بەند.

**گاتەگات**: (کە.) بە شل و نارێکی وەڕێکەوتن.

**گاتوو**: ڕەشەتوو، شامییلە، شاتوو، تووشامی. تفەرووەنی، (هەورا.) سوورە تفی، توو شەمی، (باک.) تیشەمی.

**گاجووت**: گاهییت.

**گاچاڵ**: بیر وەیا قوڵکەی زۆر فراوان و کوێر.★

**گاحۆل**: گایەکی زەلام و ناقۆڵا.

**گاح**: (باک.) گاوان.

**گاحی**: گاوانی.

**گاوانە**: گاگۆز.

**گادەر**: نێوی چەمێکە لە کوردستاندا.★

**گادڕ**: (کە.) قۆرتی لادڕ، قووڵکەی لادڕ.

**گادمە**: (کە.) گژگەم، جوورە گیایەکە.

**گادۆشە**: بە هەموو چەشنە قابێکی زل دەڵێن گارەشە. قابێکی قووڵ و سەر فراوان و بن چکۆلەی گلێنەیە مانگای تێدا دەدۆشرێت، (باک.) بیدۆش، بیردۆش.

**گاڕ**: کەر. ـــ بوون: بەزین. ـــ دان: بەزاندن.

**گار** (باک.): گوولله. وەکوو پاشگرێک بەکاردێت وەک: ڕۆژگار.★

**گارا** (باک.): جوورە تفەنگێکە.

**گاڕان**: گاگەل، کەوال، گایەل.

**گاراندن**: بڕوانە: ووشەی (گارەگارکردن).

**گارەگار**: گارکەگارک، قازەقاز، قرازەقرازە، دۆقەدۆقی مامرییە، کە هاتبێتە هێلکە. دەنگی مریشکییە لە دەمی هێلکەکردنیدا.

**گارەگارکردن**: گاڵەگاڵی منداڵی ساوا. شەڕەقسە، دەمەقاڵە.

**گاردان**: بەزاندن.

**گارس** (شکا.): هەرزن، (باک.) گوڵەپێغەمبەرە.

**گارکە** (کە.): گارە.

**گارکەگارک** (کە.): گارەگار.

**گارگارە** (کە.): بڕبڕەی پشتی.

**گارنگ** (باک.): ڕەنج.

**گارنگا** (باک.): گیایی.

**گارووس** (باک.): جۆی کێوی.

**گاریتە** (باک.): کاریتە.

**گاریسۆک** (باک.): تەرزەی گەورە.

**گاز**: غاز. مرازێکی ناسراوە بزماری پێدەردەهێنرێت. بڕوانە: گەز.

**گازاندە**: گلەیی.

**گازاندەکردن**: گلەیی کردن.

**گازەری پشتی**: دەرگایەکەی خستە سەرپشت، واتا خستیە سەرگازی پشتی.

**گازەگاز**: (دزە.) گوڕەگوڕ، قڕەقڕ، (خۆ.) گڕەگڕە. هەراهەرا، بانگەبانگ، دەنگەدەنگ، گاڵەگاڵ.

گاز

**گازر**: پارچەی بەنی و لۆکەی بە شوشتن بەو جوورە سپی کردنەوەیە: جاوی خۆکردی چەند کەژمێرێک لەنێو پەینی دەگرن، دوایە هێندەی دەشۆن و بە کوتەک دەیکوتن هەتا ڕەنگی زەردی شییاکەی بەردەدا و زۆر سپی دەبێ.

**گازک**: گازی بزمار کێشانە.★

**گازکەر**: جارچی، بانگکەر.

**گازکردن**: بانگکردن.

**گازگاز**: هاوار هاوار.

**گازگر**: گەزۆک.

**گازگرتن**: بە ددان گرتن.★

**گازمالووکە**: گازورلکە. (خۆ.) چیلکەیەکە وەبەر فاقەی دەدرێ، کە دانەکەی خورا بەر دەبێ.

**گازن**: ئەو پارچە ئاسنە دەسکدارەیە، کە چەرمی لەسەر تەختەی پێ دەڕندرێ. گلەیی، شکایەت.

**گازندە**: گلەیی، شکایەت، داواکاری.

**گازندەر**: گلەییکار.

**گازندەلێکراو**: گلەیی لێکراو.

گازنەۆک: گلەییکار.

گازن لەدەستکراو: گلەیی لێکراو.

گازۆر: هێزێکی خۆڕسکی، هێزێکی سروشتی.

گازوولکە: دارێکی دوو لکە لەسەر قوولکەیەکی دادەنرێت و دارێکی دیکەش لەنێو دوو لکەکەوە بە بەردێکی پان و قییت دانراو هەڵدەسپێرێ دانی دوو قوولکەکەی دەکەن، کە چۆلەکە دانی بخوا، دارە دوو لکەکە لە جێی خۆی نەوی دەبێ و دارەکەی دی دەترازێ و چۆلەکەکان لەنێو قوولکەکەیدا دەمێننەوە و بەردەکەش بە پانی بەسەر قوولکەکەیدا دەکەوێ.

گازی: دەنگ، بانگ. ـ کرن: بانگکردن.

گازی پشتی (موک.): لەسەر سک ڕاکشان.

گاسک: تەپڵی سەری و تەوقی سەری، تۆقەسەر. ماشە.

گاسکە: بە گۆرانی دەنگ لێوەهاتن. گاسکە گاسک.

گاسکەگاسک: گاسکە، نووزە نووز.

گاسن: گاتاسن، گا و ئاسن، گیسن.

گاشە: بەردی زۆر زل، گابەرد، گاشەبەرد، کەڤر. تاش، (هەورا.) تل.

گاشەبەرد: گاشە.

گاشەدەم: دەم زل.

گاغارە: بێشکە، لانک.

گاف: کات، وەخت.

گافا: کاتێکی، وەختێکی.

گافادی: دەمێکی دی، کاتی تر.

گاف قەلیش (باک.): هەرزەگەڕ، ئاوارە.

گافان (باک.، زا.): گاوان.

گافین: مەبەست، ئارەزوو.

گاڤر: نەخۆشی گایان.

گاڤران: گاڕ.

گاڤۆر: کەوانە، دوا مانگی پاییزێ، کە ئاوی کانیاوان کەم دەکات.

گاکەرک (هەورا.): فەرەجی، جوورە فەرەجییەکە تا ئەژنۆیان درێژ و قۆڵی کورتە.

گاکۆتر: قومری، کەڤۆک، کۆترەکێویلە.

گاکێفی: گای کێوی، (بابا.) فیلەگێژە، گا کوڤی.

گاکا: هێندێک جار.

گاگەل: گاڕان.

گاگۆز: جوورە گیایەکە گوڵی شین و جوانە و کێوییە و دانی نێو کەلووەکانی لەجیاتی ئالیکی بەگاجووتان دەدرێ. ـ ی: سەرسەری، خوێڕی، هیچ و پووچ.

گاگەل: گاڕان، گایان.

گاگلوان: تەویلەی ڕەشە وولاخانە.

گاگلوو: گیایەکە بەقەد کولیلکی نیسانێ دەبێ و گوڵی هەموو ڕەنگەیە و بۆنی خۆشە.

گاگۆر: گۆڕەفراوانەکەیە، کە لەحدی تێدا هەڵدەکەنرێ.

گاگۆڵە: گاگۆڵکێ، ڕۆیشتنی منداڵی چکۆڵەیە لەسەر دەست و پێیان.

گاگوێ: گیایەکە، گوێی بەرازە.

گاگێرە: گاینجە.

گال: گرۆگاڵ و قسەکردنی ساوایان. هەرزن.

گاڵ: بانگ. قۆزاخەی لۆکە. دی لێ کردن بۆ گەمە و قەشمەرییە. هان: ـ دان: هاندان. (موک.، جا.) هەرزن.

گاڵە: لە ئەندازە پەترکرن، زەهفکرن. قرە، قیرە، هەرا و گەمەگمکردن. هەرزنەتاڵە. ـ کردن: شرکردن، حەشرکردن. مافی تەواو دانە دەست.

گاڵەدان: داخستن.

گاڵەگاڵ: گارەگاڕ، گمەگم، هەرا هەرا، قیرەقیر، گازەگاز، گرەگر، قرەقر، شیرەشیر.

گاڵەی دەم: ووشەی هیچ و پووچی هاندانییە.

گاڵتە: وازی، جەفەنگ. قەشمەری، تەوزە، تیزە، فشە، یاری، گەمە. ـ پێکردن: قوومارپێکردن.

گاڵدان: هاندان، بزاوتن، فیتدان، بزواندن، جووڵاندن.

گاڵگاڵک (یەز.): گۆرانی لاوک، حەیران.

گاڵگاڵی: جوورە کولیچەیەکە بە ڕۆن و هێلکەوە دەشێلرێ و بە تەندووری دەبرژێندرێ.

گاڵۆک (فە.): گۆچان، داردەست.

گاڵۆکە: گۆچانێکە ئاژاڵی پێ دەگێڕنەوە و قەفەکەی لە نی دی فش و بلاوتر و ئەستوورە.

گالیسکە: کالیسکە، عەرەبانە.

گالیش (شن.): تا، گییشە.

گاڵین: ناڵاندن. ـ کردن: بە چەقەچەقی نیش دەڵێن، ناڵاندنی نەخۆشییە.

گاڵینە: نانی هەرزنی.

گامارۆ: باڵندەیەکی ئاوی ڕەشە لە پۆری چکۆلەترە و نێوچاوانی سپییە.

گاماسی (باک.): جوورە ماسییەکی زۆر گەورەیە.

گامبۆرە (باک.): گەمبۆل، ئازا.

گامۆلکی (کە.): گاگۆلکەی منداڵان.

گامیزە (دزە.): مارپێچ.

گامێش: مادەک.

گامێشەوان: خاوەن و بە خێوکاری گامێش. *

گامیێر: جوورە قالۆچەیەکی باڵدارە و درێژە و باڵەکانی کەسک یا بۆرە.

گان: نێوی جووتبوونی نێر و مێیانە. ـ کردن: جووتبوون، دروستبوون. لێهاتن. ـ ی ئاڕەوا: داوێن پیسی.

گانەوی: کەسێکە زۆر گان پەرست بێت.

گانەدەر: داوێن پیس. زۆر گەند و خراپ.

گانگاز: ئاسان کردن.

گانگلۆک (باک.): گوڵە مێلاقە، گولاڵە سوورە. گوڵەنیسان.

گانگۆڕکێ (کە.): سەربەسەرە.

**گاو:** مێخی ئاسنە دوو یا چەند پارچەی شکاوی پێ پێکەوە دەنرێتەوە. شەقاو، هەنگاو. فەردەیەک لە نێوەڕاستێوە بە دووقات کوژاندنەوە. (هەورا.) گا. کات، دەم، چاخ. لات، جێگایەکی سەختە یا سەکۆیەکی باریک لە جێگایانی سەختدا.

**گاواسن:** گاسن.

**گاوەشە:** مەشکەی گەورە، مەشکەی گاوس. کاسەی گەورە. هەموو جوورە قاپێکە فراوان و گەورە.

**گاوەشەدەم** (کە.): دەم زل.

**گاوەناس:** لوویەکی ژێر پێستە و لە خوارەوەی گەردنی پەیدا دەبێ.

**گاوبار** (کە.): کەوتنە سەر تەنیشتی زورانباز.

**گاور:** فەلە، دیان، (هەورا.) بەدڕا. بوونە ـــ: هەڵگەڕانەوە، سەرکێشی.

**گاورمەجار** (باک.): جوورە تفەنگێکی بە بەردی کاردەکات.

**گاوری سەرکۆ:** ئەو کوردە زەردەشتیانە بوون، کە مووسڵمان نەبوون و پاڵیان وە چیایاندانا، لە دوواییدا لە داخان بوونە فەلە.

**گاو و گەردوون:** قوربانی، پێشبار، پێناو. خۆکردنە ـــ: خۆ بەختکردن.

**گاوولێش** (کۆ.): تێکهەلاویتن، تێکەلاوی.

**گاوێ** (هەورا.): مانگا.

**گاه:** کات، وەخت.

**گاهگاهی:** هێندێک جار.

**گاهیت** (هەورا.): گاجووت.

**گای بنە:** گایەکە لەلای بنەوەی گیرەی دەخرێ. دووزمان.

**گای سەرە:** گایەکە لەلای سەرەوەی گیرەوەی دەخرێ.

**گاینجە:** گاگێرە.

**گاییلکە:** جوورە ئێسترێکە لە نێوانی کەر و گا دا پەیدا دەبێ.

**گە:** پاشگرێکە بە دووای هەر ووشەیەکێوە بنووسێ، شوێن و جێگا نیشان دەدا: جێگە، کارگە، لەشکرگە.

**گەبە** (باک.): ڕایەخێکە لە لبادی توکنە.

**گەبەر:** بنهەنگڵ.

**گەبەڵ:** گەبەڵدار. کۆمایەک دار یا گیایە لە نێزیک یەکتری بە پڕی ڕووابن. (هەو.) گلووی ترێ، دەستەی باڵندە، پۆل. (دزە.) گەواڵە، پەڵە هەور.

**گەبڕ** (باک.): نۆبەبڕی، بە زۆر نۆبەی کەسێکی دی بڕینەوە.

**گەبڕگە** (لو.): قەبڕخە.

**گەبری کوردی** (موک.): جوورە گۆرانیەکی کوردییە.

**گەبۆل** (باک.): کاب، قاب، دەفر.

**گەبیسە** (باک.): ساڵێکە ڕۆژێکی لە مانگی (شبات)دا زیاد دەکرێ و دەبێتە (٢٩) و ئەو ساڵە لە چووار ساڵان جارێکە.

**گەپ** (فە.): گەورە، مەزن. گاڵتە، فشە.

**گەپە** (دزە.): کەسێکە زەلام و قەلافەتێکی پان و بەرینی هەبێت، سەگی پیر.

**گەپەڵ** (کە.): گەپەڵەدار. چەند بنەدار یا پنجە گیایەکی لێک نێزیکە، کە چڕ و پڕ و تێکچڕژابی.

**گەپچاندن** (باک.): لێدان، فڕێدان.

**گەپرۆکە** (ڕەوا.، بار.، کۆ.، خۆ.) پرپرە. گەلای خڕ و وورده و گوڵی زەردە و تا دوو بستان بڵند دەبێ.

**گەپڵە** (کۆ.، شا.، کە.): گیایەکە گوڵی ئاڵ و خڕە و دەخورێت، شەقشەقۆک، گوڵۆکە، ترشۆکە.

**گەج:** گێچ.

**گەچەڵ و گوچەڵ** (هەورا.): خوێڕی و هیچ و پووچ.

**گەچران** (هەورا.): ژاکان، دەق شکان.

**گەچراو:** ژاکاو.

**گەچلان:** ژاکان.

**گەچلاندن:** ژاکاندن.

**گەچلاو:** ژاکاو.

**گەچۆڕ:** ئاوێکە لە زەوی گەچدار بێتە دەرێ.

**گەدا:** دەرۆزەکەر. هەژار، سواڵکەر، بێچارە. ـــ یی: سواڵکەری، دەرۆزەکەری، هەژاری، بێچارەیی.

**گەدە** (جا.، زەن.، هەورا.): چیکڵدانە، وورگ، بەرگەدە. (ڕۆژ.) گەدگ. (باک.) کوور. (ڕۆژ.) وورگی ئاژەڵ.

**گەدەپێست:** قۆڕ.

**گەدەک** (باک.): پالاخی گامێشییە.

**گەدگ:** وورگ.

**گەر:** ئەگەر. گەران. گەردەلوولە، گێژەڵووکە.

**گەڕ:** پێچ، خول، سووڕان. ـــ خوواردن: خول خوواردن، پێچ خوواردن، سووڕخوواردن. شەڕ، تەشقەڵە، ـــ م پێ دەفرۆشێ: شەڕم پێ دەفرۆشێ. فێڵ. پارچە زەویەکی چکۆڵەیە، کە لاپاڵی و کەناری خراپ بێ. گەڕۆڵ، ئالۆشدار. جار، کەڕەت. نێو قەفی خوارایی کەنداوییە. گێژەنی ئاوی کەنداوی. ـــ گرتن: دەورەدان.

**گەرا:** تۆدان. ـــ ی ماسی و بۆق و ئیدی. ـــ ئەسپێ: ڕشک.

**گەرقووپ** (کۆ.): قەرەقوپ.

**گەڕان:** بلاو و پەخش بوون؛ دەنگ وباس بە هەموو لایەکیدا دەگەڕێ: بلاودەبێتەوە. گەڕیان، گەڕین. ـــ ی فەلەک: چەرخی فەلەک. بە دەوردا ـــ: بەدەوردا سووڕان. ـــ ە پاشەوە. ـــ ە دواوە: پاشەکشە. لێ ـــ: بەجێهێشتن، وەدووکەوتن. بە دووردا ـــ: بە شووێندا گەڕان.

**گەڕانەوە:** بادانەوە، وادانەوە. زڤڕان، زڤڕین. لێ ـــ: پەشیمان بوونەوە.

**گەڕاندن:** گێڕان، خولاندنەوە. چەرخاندن. خول پێدان.

**گەڕاندنەوە:** گێڕانەوە، ناردنەوە، زڤڕاندن.

**گەڕانگا، گەڕانگە:** شوێنی گەڕان و سەیران.

**گەڕانۆ** (باک.): ئاوارە، گەڕۆک، گەڕیدە.

**گەڕانۆک:** کارگێڕی. کەنار. کشان.

**گەڕاوا:** بە شووێن چتێک یا کەسێکدا گەڕاو. پەشیمان، بادەرەوە. (ڕۆژ.) گڕاو، گەڕاو.

**گەرپێچە:** بایەکە وەک گەردەلوولە وایە، بەڵاَن کورتتر و ئەستوورترە. گێژەڵووکە.

**گەرەشک:** هەڵاَش. لکەداری براوە بە لق و پۆپەوە.

**گەرەک:** کۆڵاَن. کووچە.

**گەرەک:** داخوازی، پێویستی، ئەرک.

**گەرەکە:** هەردەبێت، پێویستە.

**گەرەک بیەی** (هەورا.): ویستن.

**گەرەک ناگەرەک:** پێویستە، دەبێ، گەرەکە.

**گەرەکوێرە:** شەوکوێری.

**گەرەلاوژە:** بەنۆبە و بەدەورە گۆرانی گوتن.

**گەرەو** (باک.): گرێو. ـــ کردن: گرێوکردن.

**گەرەوگزگزە:** خورەی ئاوێیە، دەنگ و خورەی ئاوێیە.

**گەرچەک:** گەنە گەرچەک، گەنەک.

**گەرچی:** ئەگەرچی، هەرچەند.

**گەرد:** تۆز. پاژێکی زۆر بچووک.

**گەردان** (باک.): لە ئەندازە پترکردن. ووزەی زیاد.

**گەردانە:** ملوانکە، خەناوکە، ملوانە، بەرمورر.

گەردانە

**گەردو:** گێژەو، بووران. ڕەشەبا.

**گەردە:** تاوریشمێکە دەکرێتە گوڵنگی پۆشی و ئیدی.

**گەردەک:** تەدارەکێکە لەو کاتەدا دەبێت، کە زاوای دەبەنە دیوی بووکێ.

**گەردەلوولە:** گێژەڵووکە، تەندورەزەنە. ئەو تۆزەیە، کە وەک مەنارە بڵند دەبێ و باریکە.

**گەردەن:** گەردن.

**گەردەنە:** گەردن بەند. ڕێگای سەر کێوان.

**گەردەنی:** گەردن بەند.

**گەردۆز** (سۆر.): خاکەی ڕەژییە. کاتێکە، کە ئاژەلاَنی نێر و مێی کێوی تێکەڵ دەبن، بە تایبەتی دەستەی نێری و بزنەکێوی.

**گەردن:** گەردەن، ئەستۆ.

**گەردن بەند:** ملوانەی پیاوان، لەچک، مل پێچ، خەناوکەی ژنان.

**گەردنکەش:** یاخیبوو.

**گەردنکەشی:** یاخیبوونی.

**گەردن گرتن:** گەردەن گرتن، ئەستۆگرتن.*

**گەردوخول:** گەڕان. گۆڕانی زەمانە.

**گەردوکۆڵ:** زەخیرە کۆکردنەوە. گردوکۆ.

**گەردولوول:** گەردەلوولە. ئەو کۆڵەکە تۆزەیە، کە با دەیسووڕێنێ.

**گەردوو وەرد** (هەو.): چاندنی دەغڵە دووای پەڵە. دوا پەڵە و تۆ چاندن.

**گەردوون:** ئاسمان، چەرخ، فەلەک. (باک.) ئارەبانەی گەنم و جۆ کێشانە. زەمانە.

**گەردێ:** هەندێ، ئەختێ.

**گەردی:** هۆزێکە لە گەرمێن و لە باکووردا هەیە.

**گەردیان:** لاربوونەوە، خواربوونەوە.

**گەردیاو:** خوار.

**گەردیلە:** پاژ لە کیمیادا.

**گەرزک** (باک.): گیایی.

**گەرساندن:** گەوزاندن. بە زۆر و بە شەڕ تێکەوەدان و گلاندن.

**گەرسین:** گەوزین.

**گەرگەر** (باک.): بەردەلاَن. خاک یا زەویەکە بەردی زۆر بێ.

**گەرگەرە** (کەل.): قرقرۆچکە. بەکرە.

**گەرگەزۆک** (باک.): غەرغەرە.

**گەرگەلاری:** سوورە قانک.

**گەرگلە** (باک.): گڵی ئەفتاوییە هەڵدەکرێ.

**گەرکوول** (باک.): ملوانەی (وولاَخانە). قردێڵە.

**گەرگ** (باک.): ئاشێکە برنجی پێ لێ دەکرێت.

**گەرگاندن** (باک.): برنج پاککردنەوە بەگەرگ. گرکاندن.

**گەرم:** بەتین. ـــ کردن: تاودان.

**گەرما:** بڕوانە (گەرمایی).

**گەرماڤ:** گەرماو، کانی گەرم، کراشۆ.

**گەرماو:** گەرماڤ.

**گەرماوگەرم:** دەست بەجێ.

**گەرماهی:** گەرمایی.

**گەرمای هەتاو:** تیپرێژ.

**گەرمایی:** گەرماهی، تاو، تین، خارشت.

**گەرمەژان:** ژانێکی ژن ئاوسە، کە نیشانەی ژانێیە.

**گەرمەژۆ** (باک.): گرمژە، گرمژەدار. ـــ یی: گرمژەداری.

**گەرمەژنە** (بابا.): گرمژە.

**گەرمەسێر:** گەرمێن، وولاَتی گەرم.

**گەرمەشین:** بەتاو و بەکوڵ شین وشیوەن کردن.

**گەرمەگەرم:** زۆر گەرم.

**گەرمەگۆڕ** (موک.، دزە.، هەورا.): دوای مردنی کەسێکی بە سێ ڕۆژان هەڵواو نان یا چێتی دیکەیە، کە دەیبەنە سەرگۆڕان و دەیبەشنەوە.

**گەرمخاندن** (باک.): ووشککردن.

**گەرمخە** (هەورا.): گەندەخە. گیایەکی شین و شلک بکەوێتە سەریەک و گەرم دابێت ـــ ی دەگرێت.

**گەرمخین** (باک.): ووشکبوون.

**گەرمزۆک** (باک.): گرمژە.

**گەرمشاندن** (باک.): هاڕین، ووردکردن.

**گەرمشتە** (زەن.): گرمژە.

**گەرمشک:** گرمژە.

**گەرمک:** کانی گەرم.

**گەرم و سارد:** تێکەڵکردنی گەرمێ بە ساردی.

**گەرمک** (باک.): شۆرباو.

**گەرمی:** بڕوانە: گەرمێتی.

**گەرمیان:** گەرمێن، گەرمەسێر، وڵاتی گەرم.

**گەرمی پێو:** ئامرازێکە پلەی گەرمیی پێ دەپێورێت.

**گەرمێتی:** گەرمایی، گەرما.

**گەرمین** (باک.): مەقەڵی.

**گەڕندە:** گەڕۆک، گەڕیدە.

**گەرناس** (باک.): پاڵەوان، ئازا. ـــ ی: پاڵەوانی، ئازایی.

**گەرنیزە** (ڕۆژ.): لاواز.

**گەرنیسە:** لەڕ و لاواز، بێ تووک. گەرنیزە.

**گەروەنک** (باک.): قوتوو. پاکەت.

**گەروەخڕە:** ملەخڕە، دووشاخە.

**گەڕۆک:** گەڕیدە، گەڕالۆ، گەڕانۆ.

**گەڕۆڵ:** گەڕ، گوڵ.

**گەڕوکێف:** هەڕمشە.

**گەڕوکێچەڵ:** تشقەڵە.

**گەروو:** هەوک، قورگ، بین، گەوری، خرخرۆکە، (هەورا.) قورقوراگی.

**گەرهان:** گەڕان.

**گەرهە:** ئەو مەڕەیە، کە دەوروبەری چاوی ڕەش یان سوورە.

**گەرێ:** پێویستە، گەرەکە.

**گەرێ:** گەلی، دۆڵ.

**گەڕێ:** گوڵی، گڕێیی.

**گەڕیان:** ڕەوت، ڕۆییــە. جووره هەڵپەڕینێکــە. (باک.) گــەڕان. فەلــەک لەمن ناگەڕێ: بەدبەختی وازم لێ نایەنێت. ژێ ـــ واز لێهێنــان. لێ ـــ: وەدووکەوتن. لێ گەڕان. لەبەر ـــ: پاڕانەوە، لالانەوە.

**گەڕیدە:** گــەڕۆک، گــەڕندە، گــەڕانۆ، بگــەڕ. خوێـڕی. گرهوێـز. ڕێتــاڵ. ئاوارە. ـــ یی: ڕێتالی. ئاوارەیی.

**گەڕین:** گەڕان.

**گەرینەک:** گیایەکە هەڵدەچێت. گەردەلوول.

**گەز:** ئاسنێکی درێژە هێندەی باڵێکیشــە، چت و پارچەی پێ دەپێورێ. دارێکە گەزی چاریشی پێ دەڵێن. گەزی چار. جووره هەڵوایەکە. ـــ کرن: گەزتن.

**گەزاوە:** بێ شەرمی، زمان درێژی، زمان شڕی. ـــ کێشان: هەڕەشـەکردن، جنێودان.

**گەزاف:** قسەی ناڕاست.

**گەزەر** (باک.): گێزەر.

گەزەر

**گەزەرەکێویلە:** جووره گیایەکی کێوییە.

**گەزەک** (باک.): گەزۆک، گازگر.

**گەزەنە** (کە.): ئەگزیا. بیرۆ. گەزەنەک.

**گەزەنەک:** بڕوانە: (گەزەنە).

**گەزەند** (فە.): زیان.

**گەزەندە** (کە.): ژەهردار.

**گەزەنگ:** زەردەی ڕۆژێ.

**گەزەنگی** (موک.): جووره ترێیەکی سپی و زۆر شیرینە و درەنـگ پێ دەگات و گلووی زل و خڕە و دەنکی زۆرە. جووره شیرینیاتێکە.

**گەزتە:** ماران گەزتە.

**گەزتن:** گەزکرن، قەپاڵ لێدان، گەستن، گەزین، گازلێگرتن. دانووسان. پێدانووسان. بە ددان ئازاری جێگایەکی لە لەشی کەسێکی دان.

**گەزن** (فە.): گەزتن.

**گەزنە** (هەورا.): گەزگەزک. ناوی دێیەکییە لە قەراخ هەولێرێ.

**گەزنەک** (فە.): خارشتی لەش.

**گەزۆ:** جووره شیرینییێکە. شۆکە. ناوی ئافرەتانە.

**گەزۆک:** گەزندە، گازگر.

**گەزی** (باک.): جووره پارچەیەکی ئاوریشمییە.

**گەزی چار:** گەز، گزی چار. دارێکە.

**گەزیرە:** جەزیرە، دوورگە. کوولـوک شوان. جووره گوڵێکی پاییزییە.

**گەزین:** گەستن.

**گەزینک:** گزنک، گەزەنک. زەردەی هەتاوی بەیانی و ئێواران لـە دەمـی هەڵاتن و ئاوا بوونیدا.

**گەستن:** گەزتن.

**گەسک:** ڕیش، کوونیسـک، گـەزک، گزک، مـل کس، مـل کسـک. ـــ دان: داماڵین، ماڵشتن. ـــ لێدان: ماڵین، گزەدان. ـــ لێدەر: ماڵشتە.

**گەسگەسک:** گەزگەزک.

**گەش:** ترووسکەدار، ئاوری ـــ: ئاگرێکە بـاش بایسێ. ـــ بوونـەوەی ڕوو: کرانەوەی ڕەنگی ڕوو و شـاد و دڵخۆش بـوون. ـــ بوونـەوە: بووژانـەوە. ـــ کردنەوە: بووژاندنەوە.

**گەشانەوە:** ڤەگەشبوون، گەشبوونەوە.

**گەشە:** شادی، خۆشی. نەشوونما. ناوی کچانە. ـــ کـردن: نەشوونماکردن. ـــ وە بوون: گەشبوونەوە.

**گەشت:** سەیران، گەڕان. ـــ یار: گەڕۆک، گەڕیدە.

**گەشتی سەرکوان** (فە.): گەڕانی سەرکێو و هەردان.

**گەشکە:** شاگەشکە، دڵخۆشی. گەشکە، چەمۆڵە، (هەورا.) خشە. ـــ ی منـداڵان: فێ، خوو، تـەنها بـۆ منـداڵان بـەکاردەبردرێت. فەرمانەکەشـی گەوە.

**گەشکە** (باک.): تبتاندن، تەبتاندن. دڵخۆشی دانەوە، نەترین.

**گەشی:** تروسکە، ڕەونەق، ناسکی و تەڕ و ڕەوشەن.

**گەشینەوە:** زەردەهاتن.

**گەف:** گەڤ، هەڕەشە، ـــ لێکردن: هەڕەشەلێکردن.

**گەفە** (هەورا.): حەپە، وەڕینی سەگ، وەڕینی سەگ لە ماندوێتیدا.

**گەفەگەف:** حەپە حەپ.

**گەڤەڵ** (دزە.): پۆل، کۆمەڵە.

**گەڤگیر** (باک.): کەوگیر.

**گەڤین:** هەڕەشە، هەڕەشەوگوڕەشە. ترساندن.

**گەڤ:** گەڤ و گوڕ، هەڕەشە.

**گەڤزتن** (باک.): گەوزاندن.

**گەڤاڵ** (کە.): کاروانی زل و گەورە.

**گەڤزک** (باک.): زەوی خیزدار، خیزماڵ.

**گەڤزەک** (باک.): گەڤزک، خیزماڵ.

**گەڤلاندی** (باک.): گەوزێندراو.

**گەڤلین** (باک.): گەوزین.

**گەڤ و گوڕ:** گەڤ، هەڕەشە.

**گەڤین:** وەڕینی سەگ.

**گەل** (هەو.): یاریدە. ـــ کردن: یاریدەدان. زۆر، کۆمەڵ. نیشانەی کۆیە، کە دەکەوێتە کۆتایی ووشەوە: براگەل: برایان، کوردگەل: کوردان، کوردەکان. ـــ یەل، ـــ یەت.

**گەڵ:** کیر و گون. نێو ـــ: گەڵ و گون. نێوانی دوو ڕانان. چڵوویەکە لە هاویناندا بۆ خواردنی ماڵاتان بۆ زستانی ئامادەیە. لەگەڵ، پاڵ، پێکەوە، بەیەکەوە.

**گەڵا:** پەلک، ولک، بەن، ولگ، پەل. پەلکی جغارە. ـــ ی دار و گیا.

**گەڵاج** (باک.): بەدکار، زیاندەر، ئازاردەر، زیانکار. ـــ ی: بەدکاری، بەدکرداری، زیاندەری، ئازاردەری، زیانکاری.

**گەڵاحە:** ملوانەیە بۆ جوانی لە ملی گوێلک و جوانوو ئیدی دەکەن، قردێلە.

**گەڵادار:** پەلکدار، پەلدار.

**گەلار:** ڕەوە (ئی پشیلە و ئی وەک وی).

**گەڵاڕێزان:** تشرینی یەکەم، پاییز، باڕێزان، چرپاپیشی، باوەر، خەزەڵوەران، مانگی نێوەڕاستی پاییزییە.

**گەڵاز** (هەو.): هەڵووچە.

**گەڵازە:** (شا.) گەڵوازە، بەرمووریکی تێکەڵاوە لە مووروو و گوێزو مازوو و جگ و گەڵوان بە لانکیدا دەکرێت لە ڕاژاندنی لانکیدا خرەخرێ لێ دێت، کە ئەو خرەخرە لە لایەکەوە منداڵی ژێر دەکاتەوە، لە لایەکیشەوە منداڵەکە بۆ خۆشی بە دەست لەبەر موورەکەوە دان وەخت ڕادەبوێرێ.

**گەڵاس** (هەورا.): گەڵواز.

**گەڵاکوتک:** کوتکی جل شووشتن.

**گەلاڵ:** دەربەند، چۆم، ڕووبار.

**گەڵاڵە:** ئامادە، نێزیکی دروستبوون، کڵاڵە. ـــ کردن: تەواوکردن، ئامادەکردن.

**گەڵاڵی:** تیرەیەکە لە جاف.

**گەڵامێو:** پەلکەمێو.

**گەڵاوەرین:** هەڵوەرینی گەڵا. گەڵاڕێزان.

**گەڵاوگەڵ:** فش، فش ڕۆیشتن، شل ڕۆیشتن. لاق لێکدان.

**گەلاوێژ:** تیرەباران. میوەگەنان، سەریسانگ، تیرمە، نیوی مانگی نێوەڕاستی هاوینییە. نێوی کچانە. گوولاوێژ. ئەستێرەیەکە لە نێوەڕاستی هاویناندا پەیدا دەبێ، کە لەوە بەولاوەشەوە دەست بە فێنک بوون دەکات. (هەو.) گیشەی گەنییە، کە گوڵی باقەیەکی بکەوێتە دەرەوەو هیچ باقەیەک نەکەوێتە ژوورەوە.

**گەلە** (کە.): مێگەل، کۆمەڵێک ئاژاڵ. لەولاو ئەولای هیرتەی نێرەکە دەدرێ تا هیرتەکە نەجوولێ. (موک.) پەلە دارێکە لە سەرێکی شمشێرەی جووتی دەدرێ، تا شمشێرەکە لە دەندە و باسکیشی جووتی نەیەتەدەر. پەل. خەپە، بەرپوولە، کرمە، هەپە، شیلەپ، بەروانکە، دارخەنە.

**گەلەخان** (هەورا.): کۆز. هۆڵی مەڕ. (کەل.) دیبوێکە پرسی لە سەرسەری و بێ شێوازان. (کە.، ڕۆژ.) تەویلە.

**گەلەخووێ:** خاوەند مێگەل.

**گەڵەسوکێ** (کە.): ناڕێک ڕۆیشتن و لاق لێکدان.

**گەلەشک** (کۆ.): هەژگ وبژاڵ، هەژگ و هەژاڵ، لکەداری براوە، کە گەڵا و لک و بۆی پێوەبێ. (شا.) هەژ.

**گەلەک** (فە.): گەلێک.

**گەلەکزان** (باد.): زۆرزان.

**گەلەکۆمە:** (دەر.) چەند خزمێک بەگەل بەگژ یەکێکیدا بچن، گەلەکۆمەکێ.

**گەلەشە** (باک.): کێشەکێش.

**گەلەنۆر** (باک.): چەڵاکی دار داکوتان.

**گەلەوان** (کە.): شوان.

**گەلەوەگەلە** (کە.): هاوگەلە کردن. دوو شوان بەرخ دەکەنە لای ڕانی یەکتری.

**گەلەوتە:** هەڤۆک، ڕستە، تنە، گردە.

**گەڵباخی:** هۆزێکی کوردە.

**گەلت** (باک.): جوورە فەرشێکە.

**گەلحۆ:** کێل، گەوج.

**گەلش:** کێشەکێش.

**گەلشۆک** (باک.): کێشە پەرست، شەڕانی، شەڕفرۆش.

**گەلفاندن** (باک.): دردو نەرم کردن. کوتان، هەڵوەراندن.

**گەلفچاندن** (باک.): هەڵوەراندن، ووردکردن.

**گەلفین:** کوتران، هەڵوەرین. ووردکراو.

**گەلفچی:** گەچراو، چرچ، سیس.

**گەلفچین** (باک.): هەڵوەرین، ووردبوون، سیس بوون و گەچران. لە خوێن و خوڕ وەردان.

**گەڵگەمزوو:** گەزۆ و گەڵای تێکەڵاو.

**گەلگەل:** کۆمەڵ کۆمەڵ.

**گەلۆ** (باک.): ئایا، ئاخۆ، داخوا. چەند کەسێکی پێ بانگ دەکرێ. هۆبرا، فلانی، کابرایینە، گەلان، گەلینە.

**گەڵوازە** (موک.): ڕستەی موور و چک و مازوو، مووررووی شینە وەکوو ژەکە بە لانکی منداڵاندا دەکرێ، گەلاژە، گەلاس.

**گەلۆر** (زا.): خوێڕی، بێ دەستەڵات، گێل و حۆل، پیاوی نازیرەک و تەمبەڵ و خوێڕی.

**گەلوو**: گەروو، گۆلی، سەرەوەی نێوانی دوو چیا یا ملە یا تەپۆلکانەکە دوو دیوی لێوە دیاربێ.

**گەڵوو** (هەورا.): خرێکی تەنگ و قووڵەکە لە هەوراز بێتە خووارەوە.

**گەڵووان**: گڵوان، (شار.) گلیر، گووڵنە، گوولیر، گزگل، گوولوان. یەکێکە لە بەرەکانی دار مازوو.

**گەڵوگون**: گەڵ، کیر و گون.

**گەلوویی** (کە.): گەروو.

**گەلێ**: گەلێک، زۆر، ئێجگار، زۆرزۆر.

**گەلێر** (باک.): چەندین، فرە.

**گەلی**: گەروو، تەنگە، وەکوو گەلی عەلی بەگ.

**گەلێک جار**: زۆرجار، (باک.) پەریجار.

**گەم**: لغاو.

**گەمار** (باک.): پیس، زبڵ.

**گەمارگە**: زبڵخانە.

**گەمارۆ**: هێرش، پەلامار. دەورەدان، چووارلاگرتن. ـــ دان: دەورەدان، ئابلۆقەدان، ـــ ی زەریایی: ئابلوقەی زەریایی.

**گەماری** (باک.): چڵکن، پیسکێژ.

**گەماڵ** (جا.): سەگ، گۆڵسەگ.

**گەمە**: یاری،وازی. ـــ کردن: لەهیستن. ـــ چکۆڵە: لەهیستۆک. ـــ کەر: لیزەر. ـــ پێکردن: لەیزاندن. گەپ، فشە، قەشمەری، تەوزە، تیز، حەنەق. تەرانە. ـــ چی: گاڵتەچی.

**گەمبۆڵ** (هەر.): بزنێکی ڕەشە تووکەکەی زۆرە و لە نێ مەرەزی کورتترە و بۆ ڕەشماڵی دەست دەدات. گۆڵسەگ، گەمبۆر، سەگی زۆر زل.

**گەمەگا**: شوێنی گەمە و ڕابواردن.

**گەمراندن** (باک.): جوێ کردنەوە. بڕوانە: (گەمرە).

**گەمرە** (شا.، سنە.): کەمرەی تەویلان.

**گەمرین** (باک.): جوێ بوونەوە.

**گەمزەڵ**: گێل، حۆل.

**گەمشاندن** (باک.): بە مستی کوتان.

**گەمشۆ** (باد.، زا.، نەهـ.): گێل، حۆل.

**گەمشین** (باک.): کوتران.

**گەمۆر** (کە.): خوێڕی، سەرسەری.

**گەمۆڵ** (هەر.): بزنێکی ڕەشە تووکەکەی زۆر و لە نێ مەرەزەی کورتترە بۆ ڕەشماڵ دەست دەدات. قاپ، دەفر.

**گەمێ**: کەشتی، گەمی. جلەوی ـــ: سوکان. ـــ وان: کەشتیوان.

**گەن**: بۆگەن، خراپ، بەد، گەند. کورتەبالا. ـــ بوون: هێشان.

**گەناو**: ئاوی بۆگەنی وەستاو، گەنکاو.

**گەنان** (کە.): بۆگەن بوون. ـــ دن: بۆگەنکردن، خراپکردن.

**گەنە**: گەنەی وولاخان. دەعبایەکی ئاوساوە لە قرنوو گەورەترە پتر بە ڕەشە وولاخانەوە دەنووسێ.

**گەنەدار** (بلـ.): دارێکە وەکوو عەرعەری وایە، بۆ شمشاڵ و بلوێر دەبێ نێوی کلۆرە.

**گەنەژ** (کر.): بڕوانە: گەندەژە.

**گەنەک**: گەرچەک.

**گەنەکەواڵە**: جوورە گەنەیەکە بەهەر کەسێکەوە بدات، تووشی ئاساخێکی درێژی دەکات.

**گەنەگەرچەک**: گەرچەک.

**گەنەگەنە**: تاپۆ، دەرمانی نۆبەتێیە، نۆبەتێ بڕ.

**گەنەمە** (بلـ.): پنچە گیایەکی کێوییە وەکوو گەفی وایە و هێندەی ویش بڵند دەبێ، بەڵان گوڵەکەی وەنێ جۆی دەچێ. گیایەکە دەدرووێتەوە لە زستانێدا دەدرێ بە ماڵاتان.

**گەنج**: خەزینە، گەنجینە، هەرزەکار، لاو، تۆلاز، جحێل. قەفی قامیشی.

**گەنجانە**: لاوانە، هەرزەکارانە.

**گەنجایەتی**: گەنجێتی، جحێلاتی، تۆلازی، لاوانی.

**گەنجفە**: گەمەپێکردن.

**گەنجدار**: گەنجینەوان، گەنجوور، گەنجینەدار.

**گەنجینە**: خەزینە، گەنج. شانشینی، خەلووتی، ژوورێکی بچووکە لەنێو یەکی گەورەدا. ـــ دان: گەنجینەدار.

**گەند**: گەن، بۆگەن.

**گەندەژە** (کرما.، بابا.): بۆگەن، گەنەژە، خوار، ڕەزیل، خراپ، بەد، گەنە. گیای ژاکاو و شێلراو و گنجاو. ـــ کردن: خراپەکردن. ـــ خۆر: پیسکێژ، چەپەڵ خۆر. ـــ موو.

**گەندەڵ**: داری پزیو و کرمن و کلۆڵە.

**گەندەموو**: ووردەی تووک و پەڕانە.

**گەندخە** (باد.): گرمخە، گنخاو.

**گەندمە** (موک.): ترێیەکی ڕەشی گلووی خرە و هێندەی مازوویەکە دەنکی هەیە.

**گەندوگوو**: گەنووگوو.

**گەندی**: پیسی، پیسکیری. خراپەکاری.

**گەندی هەپروون**: تێکچوونی چیکڵدانە.

**گەنکاو**: گەناو، ئاوی بۆگەنی وەستاو.

**گەنگاز** (باک.): ئاسان. ـــ ی: ئاسانی.

**گەنگەرە**: قەرەباڵغ و هەرا.

**گەنم**: دانەوێڵەیەکی دەنک ووردە و دەکرێت بە نان. ـــ پاککردن: (هەورا.) گەنم پاککردەی. ـــ دابێژتن: (دەر.) گیژەکردن. ـــ لێکردن: هاڕین. ـە شامی: گوڵەپێغەمبەرە. ـە کوتاو: گەفەقووت، دانەقووت. ـە ـــ زەردە: جوورە گەفێکە. ـە حۆلە: حۆلەڕەزایی، جوورە گەفێکە. (باک.) ـــ ی: ڕەنگی بەرووی، بەرووڕەنگ. ـــ ین: ڕەنگی گەنم، گەنم ڕەنگ.

**گەنووس** (باک.): بەرچاو تەنگ.

**گەنووگوو**: گەندوگوو.

**گەنی** (باک.): بۆگەن، وونبوو.

**گەنیان** (فە.): بۆگەنی.

**گەنیک**: بۆگەن، وونبوو.

**گەنین** (کە.): بۆگەن بوون.

**گەنیو** (فە.): بۆگەن.

**گەنیو**: بۆگەن.

**گەو** (فە.): مانگا. جغز، دیوار یا ئەو شاخەی وەکوو ئالقەی لێ هاتبێتەوە. قوڵفی گۆرەوی وئیترە، ئەو شوێنەی شیشەی تێدەنرێت.

**گەواڵ**: تەرەس، دەویت، دەیووس، قوورمساخ، ماسکێش، بۆ جنێو بەکاردەبرێ.

**گەواڵە**: پەڵەهەور. (دزە.) گەبەڵ، پارچە هەورێکی گەورەیە.

**گەوە**: چەڤانەک، باویش، پێچ و خوارایی ڕێگایانە، لۆقە، قەمچ، (هەورا.) قەمچ و پێچ.

**گەوەڕ**: سەختی، بڵندایی بە دەورەی کۆتکانەوە بۆ جوانی لێ دروست دەکرێت. جغزی بڵندی دەورەی کۆتکانە. (ڕەوا.) نغمەی دیوارییە. بنچینە، چاڵاو و بیر، بنەڕەت. نێوقەد یا بنی چاڵاو یا قووڵکانە، کە بۆ هەر لایەکی وەبنی دابێ. (گەر.) کەوک. پەنا یا بن بەردێکە باران و با نەیگرێتەوە. سواندەی شاخانە، شاخێکە سەری بەلایەکیدا شۆڕبووبێتەوە و سێبەری کردبێ.

**گەوەزە** (کە.) کەسێکە زۆر خۆی بە دەڤ ڕادەگرێ و زۆر لە خۆڕازی. لە خۆبایی.

**گەوەن**: گیایەکە، گوینی.

**گەوەند**: زەماوەند، گۆڤەند.

**گەوج**: گێل، بێ مێشک، هێڕ، نەزان، بالە، ڕەوتەلە، تۆلاز، هوور، کەرکەرە.

**گەوجانە**: گێلانە. گێلی.

**گەوجە**: گێلە، نەزانە. هەڵووچە.

**گەوجی**: بۆدەڵەیی، لەگامی. گێلی.

**گەودار**: کەوانەدار، بەگەڕ.

**گەودە**: لەش. بەدەن. قەڵەوی.

**گەودۆنە** (باک.): ترێی ڕەش.

**گەور** (باک.): جووان. ـــ امن: جووانی من (بۆ مێ)، ـــ ێ مێر: جوورە ترێیەکە.

**گەوڕ**: ڕەنگێکی سپی پەسندە. بۆر، خۆڵەمێشی، ڕەنگ بۆر. (کەل.) هۆڵی مەڕان. (هەورا.) تەویلەی ڕەشە ووڵاخان. بن ـــ: بن چاڵ.

**گەوران**: مەجوس، ئاگرپەرست. (باک.) بێ دەنگ کردن. تێپەڕاندن.

**گەورایی** (باک.): ئەوەی لە شیر دروست دەکرێت وەکو ماست و ڕۆن و دۆ، سپێنەی هێلکە.

**گەورە**: مەزن، بەگ، ئاغا، ـــ بوون: پێ گەیشتن، پەروەردە بوون، ـــ کردن: پێگەیاندن، پەروەردەکردن، زل، زەلام، ـــ پیاو: بۆکەبۆکە. ـــ ترین: هەرەمەزن. ـــ ترین بەشکەری ناو کۆیی: بەشداری هاوبەشی هەرەمەزن. ـــ دێ: شارەدێ، ئاغا، خاوەندی دێ. ـــ: (باد.) کەنکەنە. ـــ کچ: کیژی عازەب. ـــ مار: ماری زل. ـــ ماڵ: خانەدان، ـــ کەر: میکرۆفۆن. ـــ یی: زلی، زەلامی، پایە بەرزی، مەزنی، مەزناهی.

**گەورەبوون**: پەرەواز بوون، فرازی بوون.

**گەورک** (باک.): هۆزێکە. (خۆ.) مەڕ، کاوڕ یا بەرخێکە، کە هەموو سەر و لەشی بۆرە. (باک.) ڕووناک.

**گەورۆلە** (باک.): گەوریبسۆک.

**گەورۆنە** (باک.): گەوریبسۆک.

**گەوری** (باک.): گەروو.

**گەورین** (باک.): بێدەنگبوون، تێپەڕین.

**گەوز** (ڕۆژ.): داس دوور هاوێژتن و دەغڵ زۆر وەبەردەمی داس خستن.

**گەوزاک** (کە.): لەلەکردنی داری تەشی تا بەنی پێوەڕاوەستێ.

**گەوزالە** (کە.): کەلافی. (ڕۆژ.) کەلاف. هۆنینەوەی پیشۆک، پیفۆک وەکوو کەلاف.

**گەوزان**: تلانەوە، تلینەوە، گەوزین، پلکانەوە.

**گەوزانەوە**: خۆ لەسەر زەوی یا دۆشەک بەڕاکشاوی ئەودیو ئەو دیوکردن، گەوزین.

**گەوزاندن**: گلماندن، هەڵشێلان، تلاندنەوە، گەرساندن لەسەر تەنیشت و پشت و زگ و بە هەموو لایەکیدا بادان و سووڕاندنی کەسێکی یا چتێکی دی. (ڕۆژ.) پلکاندن، گلملاندن، پەرخاندن.

**گەوزە**: تێداوەرسووڕێنەوە، ـــ داس: هێندەی داسی.

**گەوزدان**: گەوزین.

**گەوزگە** (ڕەوا.) جێگای گەوزانێ.

**گەوزین**: گەڤلین، گەوزانەوە، گەوزدان، تلانەوە، تلینەوە، گەرسین، گەوزان، پەرخین. لەسەر تەنیشت و پشت خۆ بادان و سووڕاندن. پلکانەوە. گلملان.

**گەوشەک** (کە.) نەرم، هێمن، هێدی، لەسەرەخۆ.

**گەوکردنەوە**: پێکەوەلکاندن، یەکگرتنەوە.

**گەوگەمری**: گەورەکچ، بەدبەخت.

**گەوگەو** (باک.): مێشەکەرانە.

**گەولاز** (باک.): ڕستە و ڕیزی ژووران. ڕیزی چاوەخانووان.

**گەوو**: گەدە، چیکڵدانە، ئاشک، ئاشگە. گەوک.

**گەوهەر**: بە هەموو جوورە بەردێکی نرخدار دەڵێن وەکوو دوڕ و یاقووت و زمرووت و ئیتر. جارجارەش بە خواستنەوە (استعارە) بۆ (خووێن) یش بەکاردەبرێ. نێوی ئافرەتانە.

**گەوی**: هاری، ڕک هەستان.

**گەهـ** (باد.): نۆبە. گە.

**گەهیشتن**: گەیشتن.

**گەی**: ڕکەی ئەسپ و ووڵاخ. زمان گرتن، گیرانی زمان.

**گەیاندن**: ڕەساندن، گهاندن، پێگەیاندن.

**گەیشتن:** گەهیشتن، (فە.) ڕەسین. پێک ـــ: گەیشتنەیەک. ڕێکەوت. گها، گهان، گهشتن، گهاشتن، گهای، گەیین، گەهیشتن. لێکەتن. پێ ـــ: وێڕاگەیشتن. ـــ گە: شوێنی گەیشتن.

**گەیە** (لو.): چیکڵدانە، وورگ.

**گەیشتوو:** گەهشتی، بۆ میوە و چتی تر، بە قۆناغ گەیشتوو، گەهی.

**گەیگر:** گەیگیر، خەم، خەفەت.

**گەیگرتن:** خەم خواردن، زمان گیران.

**گەینەبەرەوو:** گەیشتن، گەیین.

**گەییک:** بڕوانە: ووشەی گەیشتوو.

**گەیین:** گەیشتن، ڕەسین، گەیشتنی میوە، (هەورا.) یاوای.

**گەییو:** گەیشتوو.

**گپ** (هەورا.): گووپ، ڕوومەت. ـــ بوون: مت بوون.

**گپن:** کەسێکە خڕپلانە و قەڵەوی خڕپن.

**گت:** قایم، قیت، زەق، چاوکراوە.

**گجگ:** (ش.) ڕق، ڕک.

**گجگجاندن** (شن.): ڕاوەشاندن، تەکاندن.

**گجوور:** هەموو جورر.

**گجوولە** (خۆ.): گوجیلە سەگ، تووتکە سەگ، تووتک.

**گجی** (هەورا.): کراس. ئاخۆران. تاڵان و برۆ.

**گچە** (کە.): بۆ لێخوڕینی ڕەشە ووڵاخان بەکاردەبرێ. وەجە.

**گچکە:** بچووک، ـــ تر: بچووکتر، چکۆڵە، تووژک، تیژک، ووردەڵە، وورد، بچکۆڵە، بیچکە، ـــ یی: بچووکی.

**گچکۆکە:** چکۆڵە.

**گخ** (کۆ.): کخ، (موک.) قخ، ـــ ە: کخە، قخە، بۆ ئاگادار کردنەوەی منداڵانە و بەرزاراوەی منداڵان دەکەوێت.

**گدە:** وشەیەکە بۆ بانگکردنی بزنان بەکاردێت.

**گدرانە** (باک.): بەرازی کێوی.

**گدێ:** بۆ بانگکردنی بزنان بەکاردەبرێت. ڕەزیل. بێ سەر و پێ. ـــ کرن: ڕاقەکرن. ـــ یی (باد.) ڕۆڵە، بۆ شکاندنەوە بەکاردەبرێت.

**گدێ** (فە.): دەرۆزە. (باد.) بۆ بانگکردنی کەسێکی بەکاردەبرێت. ـــ کار (فە.): دەرۆزەکار، سواڵکار.

**گر:** سەگ یا ووڵاخ و چتێکی بگری، گیرندە. زەبر، زوور، گەورە، مەزن، درشت، قەڵەو. تەپە، گرد. (باک.) بە پەرۆش، کز. کەژ، گۆنەر. ـــ زستان: وەرزی زستان.

**گڕ:** دەورە، کەنار، ـــ گرتن: دەورەگرتن. ـــ ی ئاوری: هەڵاوی ئاگری. ـــ گرتن: سووتان، نەستوورایی، تەشەنە. ددانی ـــ: کەسێکە ددانی درێژ و گڕ و دیاربێ. دەنگی ـــ: ئالیگووشک. ـــ ا: گەورە، زل، تەپۆلکە. (هەورا.) گەرا.

**گراو** (باک.، باد.، هەر.): شیو، چێشت.

**گراڤ** (باک.): دوورگە. گرەو. ـــ ە: دوورگە.

**گرانگر** (باک.): گورەگوڕ. گشتی، بە هەموو بۆ چوونێک.

**گرام** (باک.): گران.

**گران** (باک.): سەنگین، لەسەرەخۆ. قورس، کێشدار، دژوار، سەخت، تووش، بەنرخ، نرخدار، بەهادار. ـــ لێهاتن: لە دڵگران هاتن، گووزهاتن. ـــ ایی: قورسایی، سەنگ. بەنرخ، نرخدار، گران بەها. ـــ باری: باری گران، نرخدار. ـــ باوەڕی: باوەڕگرانی. ـــ جان: گرانفرۆش. ـــ جانی: گرانفرۆشی. ـــ ە ڕوو: بە ئابڕوو، بە شەرم، بە حەیا. ـــ کار: (کە.) ئەو ووڵاخ یا ئاژاڵەیە، کە بەحاڵ چەقۆی بکاتێ. ـــ کێش: بە بەها، بە نرخ. ـــ مێرد: ئەو کەسەیە، کە لەسەرخۆ هەڵدەستێتە سەرپێ. گرانی، سەنگین و گرانی، سەلاری، لەسەرەخۆیی. ـــ ی: قاتی، نەهاتی، گرانێکە چ دەست نەکەوێت. (باک.) جوورە هەڵپەڕینێکە.

**گڕان:** تاوی گەرما، سەختی گەرما و گەری. (هەورا.) داگیرسان، سووتان، گرگرتن. ـــ ە: کێش، سەنگین.

**گرانەتا:** تیفۆ.

**گرانەتێ:** گرانەتا.

**گرانەخەو:** دەردێکە لە گرانەخەوی پەیدا دەبێ.

**گراو:** چێشت. گیراو، بەندی، حەزلێکەر، دڵدار، سەوداسەر، دڵکەتی، ئەبداڵ. ـــ انە: دڵدارانە.

**گڕاو:** گەراو، ئاوی گەرم وسوێر، ئاوی کانزایی. ـــ ی: حەز لێکردن.

**گرە** (باک.): گرێ. (هەورا.) خوڕەی ئاوی.

**گڕە:** بای زۆر گەرم، تین و هاڵاو. (بابا.) زریان. ـــ کوێری: نەخۆشییەکی چاوانە ئێکجار ئاودەکات و دەخورێت. ـــ گر: قیرەقیر، گورەگوڕ. ـــ گرە: (باد.) بڕەبڕ. (موک.) ـــ مەلا: ئاورۆچکەی منداڵان.

**گرەو:** مەرج، نەزر، گریو، گرۆ. ـــ ای: (هەور.) گریان. ـــ ەی: (هەورا.) گریان. ـــ ەرە: خشتەک. پارچەی بنپەنگڵە چ لە کراس و چ لە کەوا. (موک.) گرۆڵ.

**گرپوونەوە** (کە.): دان گری سەگ.

**گرپە:** گرفە، دەنگی ئاوری. گڕ، بڵێسە. ـــ گرپ: گرفەگرف، لرفەلرف.

**گرتەک:** شەمچە، شخارتە. (خۆ.) بازەڵە.

**گرتەکووبا:** برینێکی پیسە وەتی تیراوێ دەچێ( سەرەتان).

**گرتەی** (هەورا.): گرتن.

**گرتەیەرە** (هەورا.): داگرتن.

**گرتەی مز:** بەرمووڕ.

**گرتەی وەر** (هەورا.): گرتنەپێش.

**گرتک** (کە.): پلەی گۆشت.

**گرتن:** گرن، گیران. لێ ـــ: ڕەخنەگرتن، وەرگرتن. خۆ ـــ: خرچاندن. بە دزی گووێ لە قسەی خەڵک گرتن. لێ ـــ ەوە: وەرگرتنی نەخۆشی. وەستان لە یارمەتی دان. ـــ ەبەر: ڕۆیشتن بەرەو... ـــ ەپێش: نیاز، مەبەست. ـــ ەسەر: سەرگرتنەوە، دیتنەوەی چتی دزراو. ـــ ەمل: پەیمان دان. ـــ ەنار: گەمارۆ دان. ـــ ەوە: دەرمان ـــ. دووبارەگرتنەوەی بەرەڵاکراو.

**گرتوو:** بەندی، گیراو، گراو، گرتی، زیندانی. ـــ خانە: بەندیخانە، گرتیخانە.

**گرتی:** بەندی، گیراو.

**گرتیخانە:** بەندیخانە، گرتووخانە.

**گرتینەک** (باک.): پسوولەی پارەدان.

**گرچوو:** گوورچوو، گوورچک. بە نەختێک خوارەوەی بن هەنگڵ دەڵێن لە لەشی مرۆیان.

**گرخۆر:** زۆرگەر، سوورخۆر.

**گرخوواردن:** گەڕان، خولانەوە، سووڕانەوە، خولدان.

**گرد:** گڕ، خڕ، کۆ، تەپە، تەپلاک، ــ بوونەوە: کۆبوونەوە. ــ کردنەوە: کۆمەڵکردن. ــ مۆڵە: گرمۆڵە. ــ ژلک: تەپۆڵکە.

**گرداڤ** (باک.): گێژەڵووکە، بەدبەختی، بەلا، گێژاو، ڕووشە.

**گڕدان:** گەڕان، ئاورتێبەردان. (دزە.) دەست بەسەرداگرتن، زەوتکردن.

**گرداو:** گەرداو، گێژاو، گێژەن، گێژەنگە. بەلا، بەدبەختی.

**گردە:** برنجی گردە، (کە.) نانێکە ئاشەوان دەیکات، خەپلە. ــ با: (فە.) گەردەلوول. ــ ئاو: (فە.) گێژاوی ئاوێ. ــ بڕ: جۆرە مشارێکی قووڵ و پان و بەهێزە، جۆرە بڕینەوەیەکە لەنێو قەد دا دەبڕێتەوە وەکوو شووتی و کاڵەک، کە لەلای خڕی ببڕێتەوە. ــ کان: (جا.، دەر.) گوویز. ــ لووک (دەر.): تەپۆڵکە. ــ ڵە: (هەورا.) گردەڵی، گرۆڵ. ــ نشین: دەسکورت، پەرێشان، بێکار. ــ نشینی: بێکاری. ــ واری: ماڵداری، گردوکۆ، کۆمەڵایەتی.

**گردەبوونەوە:** بڕوانە: گردبوونەوە.

**گردک:** بەو پلە گۆشتانە دەڵێن، کە دەخرێتە نێو دیزە و مەنجەڵی و لە جنچکی گەورەترە. (باک.) قەڵەوایی، بەڵەک.

**گردووکۆ:** ماڵداری، گەرد و کۆڵ. ــ کردن: وەرگرتن.

**گردووکی:** جۆرە درووماێنکە.

**گردی:** خڕی. کۆکراوەیی. گشتی، تەواوی.

**گردیلە:** خڕ، کۆ. ــ ی ڕۆژێ: گۆی خۆر.

**گردێنک:** (باد.) پەت.

**گرز** (باک.): دڕواوی، دڕوودار. ــ ە: هەرزە، بێفەڕ، تووڕەهات. ــ یەتی: بێ فەڕی. ــ ک: (باک.) وورگن، زگ زل. ــ ێتی: (کە.) بێ فەڕی، پیسی، پەستی. ــ یک: (باک.) جۆرە سیرێکە.

**گرژ:** مۆن، گڤن، کرژ، گرش، گرنج. دارێکی ئەستوورە بە چەشنی دوو لە بیناکردندا بەکاردەبردرێت. ژاکاو. ــ اندن: شلوێ کردن، شڵەقاندن، تێکوەردان. ــ بوونەوە: دووبارە نێوچاو تێکچوونەوە. با خوواردنی ڕیس. ــ ە: لەچەری، ڕژدی، بەرچاوتەنگی. نزمی. ــ ی چارەترشی، مۆنی. ــ ژین: شلوێ بوون، شڵەقان. ــ وە: پێکەین، گەشینەوە، زەردەخەنە، زەردە، لێوخەندە.

**گرژاڵک:** گیایەکە نیوگەز پتر بڵندە و تاڵە و دەکرێتە گەسک، تەنها بۆ ماڵینەوەی قەراخی خەرمانان بەکاردەبرێ. گوژاڵک.

**گرس** (باک.): کز. ــ ان: مەیینی ماست و نیدی. خۆگرتنی شەتڵ و نەمانە. ــ انن: هەڵگیرسان.

**گرسەندن** (کە.): ئاورگرتن، داگیرسان، گڵپەکردن.

**گرسیاک** (کە.): گرساو، گیرساو.

**گرش:** گرژ. ــ ە: وورشە، تروسکە، ڕووناکی. ــ ە گرتن: تروسکە تروسکی ئەستێران، جریوەجریو، وورشەوورش، ڕووناکی.

**گرفە:** گرپە، کڵپە، دەنگێکی ئاورییە. ــ گرف: گرپەگرپ، گڵپەگڵپ.

**گرفت:** زگ گیران، هەزم نەکردنی خۆراک. ــ ار: دووچار، تووش هاتوو، تووش بوو، پابەند. ــ ی: پابەندی.

**گڕک:** کەسێکە یا چتێکە زۆر بگری. دەردێکی وولاخانە. خارشت. بە هەموو چتێکی خڕ دەڵێن وەکوو ئەنگووتک بێ. گرد، تەپۆڵکە، سپاردە. جێگەی پێگەیشتن، ــ گە. گرکە. تڵتە و خڵتەی ڕۆنی. بە سپیکردنی برنجیش دەڵێن، کە بەگڕگڕ سپی بکرێ.

**گرکاندن** (باک.): پاککردنەوەی دەغڵ و برنج لە تێکوڵەکەی. گرگاندن.

**گڕکە** (موک.): خرچان، خرچە، خرچکە، زرک، گزرک، کاڵەکی نەگەیشتوو. (باد.) ژان و ئازاری حەیوانانە، کە خوێنی گووێیان بەرنەدرێ دەیان کوژێ. (خۆ.) خارشت. ــ زەوی: زەوی بێ گیا و ڕووت.

**گرکین** (باک.): پاککردنەوەی دەغڵ و دانی لە گرگران.

**گرگر** (باک.): گەڕانەوە، چەرخانەوە. لە ــ کران: گرکین. ــ ە: گرنک، سرنج ڕاکێش. ــ ۆک: عەرەبانە، ئارەبانە. ــ انێ: (هەو.) گەمەیەکی مندالانە.

**گڕگڕ** (کف.): گەرک. ئاش یا دەستاڕی دارە چەڵتووکی پێ لێ دەکرێ. کرە. ــ کردن: گرک کرن، برنج سپی کردن. غەڕغەرەی سەر چالاوە. (هەو.) دارێکە سەری هەردووک شەغرەکان پێکەوە دەنووسێن و دەکەوێتە سەر پشتی وولاخان. ئارماز.

**گرگن** (کە.): کوڵەبنە، کورتەبالا. مرۆی لاواز و نابووت و گچکە.

**گرماندن:** دەنگی بەرزلێهاتن. دەنگی ڕووخانی خانوو و چیا و ئیتر. گرمە هاتنی تۆپ و تفەنگ.

**گرمە:** دەنگی گەورە، لرمە، گرم، بلێچ، گۆڵە. ــ ی تۆپ: لرمەی تۆپ. ــ گرم: گرمەی گەورەی بەدوویەکدا هاتوو. گۆڵە گۆڵە.

**گرمەرۆ:** سۆ، ئەستوورایی، یەغان، گژرە.

**گرمژە:** (هەورا.، باک.) گەرمەژۆ، (بابا.) گەرمەژنە، (دەر.) گرمشت، (زەن.) گەرمشتە، گەرمژۆک، گەرمشک. ــ دار: گەرمەژو.

**گرمۆچە:** گرمۆڵەی لە قوڕ دروست دەکەن بە قۆچەقانیەکی تایبەتی، کە کەوانە و ژێی پێ داوێژن.

**گرمۆڵە:** گرمۆچە، گرموولە، گردمۆلە، چتێکە خڕ و چکۆڵەبێت.

**گرموولە:** گرمۆڵە.

**گرم و هۆر:** گرمەگرم و دەنگی زۆر.

**گرنج** (هەورا.): گنج، گرژ، لۆچی ڕوو، گڕنی گڕنی. گرژی پرچی ژنان. دانەی ڕەشی نێو برنجییە. ــ اوی: لۆچاوی، گنجاوی. ــ گرنج: گژگژ، لۆچ لۆچ، گنج گنج. ــ گرنجاوی: گنج گنجاوی.

**گرنک:** بایەخ، بەرکەتی، گرگرە. پێشەم. ــ ی: بایەخداری، پێشەمی. بە ــ زانین: بە هەند زانین.

**گرۆ:** بەرە، دەستە، کۆمەڵ. شیربرنج. ــ کە (خۆ.): پەڕی لە ئەسپنگی گەورەترە و بڵند نابێ. (ڕۆژ.) ــ کە: ئەسپۆن. ــ فک: گلۆڵەی بەن یا دەزو و ئیدی. ــ ڤەر: خڕ.

**گروان:** گووروان.

**گرواندن:** پێستی ئاژاڵ یا وولاّخی بە مەشکە دەرهێنشتن.

گوراندن، پێستی داری بە فیچقە بە لوولە دەرهێنان. زۆر دەست لە برینان دان.

**گرودەڵ:** گرژلّی بەرگان.

**گرویف:** چەق وتەف.

**گروگاڵ:** وورتە وورتی منداڵ.

**گروفر:** کروفر، خۆبە گەورە پیشاندان.

**گرۆفەر** (باد.): خڕ، گرد.

**گرۆل:** سەگی گردی و گەرپدە. پارچەیەکی گچکەیە لەبن هەنگلی دەکرێتەوە. گردەڵێ. چاپخە، خشتەک، گرەوەر. گردەڵە، گلوەر، گلۆر.

**گرواز** (خۆ.): سوورانەوە، چەرخ خواردن لە تۆپێندا، چەرخان.

**گروو:** (کۆ.) بیانگە. (هەو.) ورک، (خۆ.) بنارە. (کۆ.، رەوا.) درنگە، (هەورا.) دەرناگە. ــ گرتن: رک گرتنی منداڵان. ــ یی: نەخۆشی پێستی.

**گرووتن:** بڕوانە: گوروون.

**گرووز:** درشت، نالەبار، ناهەموار.

**گرووزە** (رەوا.) زیندەگۆشتی بن برینان.

**گروون:** بە مەشکە دەرهێنان.

**گرووێ:** ئاولاوی، خورییەکەدار، هاوڵەروو. رووخورۆک. گروو، گرۆ، گوورپوو، گەر بۆ مرۆ و وولاخ و ئاژاڵ. خورشت دار، خوریکاوی. ــ یی: گەری، خورشت، خارشت، گرک.

**گرهوێر** (رژ.): گەمۆر، بگەڕ، خوێری.

**گری:** گریان.

**گڕی** (رژ.): بڕوانە: گڕ.

**گرێ:** خەربۆک، قۆپک، سوو، قەرقەف. قۆرت، ئەگەر، تەگەر، تەگەرە، پەتەر. ــ دان: بەستنەوە. (باک.) ــ بوونەوە: کەوتنەخووار. ــ کردنەوە: زههڤکرن دەر. لێ ــ دان: بەستن. ــ قوڵفە: گرێ بە قوڵفە. ــ پووچکە: گرێ کوێرە، گرێ کوورە. ــ چوو: گریچک. ــ دراو: خەربۆکی. ــ گرێ: تەفقەف.

**گریان:** گرین، کرووزانەوە، فیکە، کارەکار، کالین، گری، گیرستن.

**گریاندن:** بە گریان هێنان.

**گریای** (هەورا.): کولاّن.

**گریتی:** کوولەکە.

**گرێچک:** گە، گرینچک.

**گریچک** (باک.): گرێ پووچکە.

**گرێچن:** چنین وتەنینی گرێ گرێ وەک پشتێند، سیخمە، کلاّو.

**گرێدان:** بەستن.

**گریز:** کەفی زار. ــ کەتن: کەفکردن.

**گریژەنە** (جا.): گرێ درێژەکەی ریسمەیە. ریسمە. کێجەنە، سیوسیوە، چیوچیوە، پازنەی دەرگە.

**گریشمە:** دەلال، ناز. هێما.

**گریڤووتک** (باک.): گرێ پووچکە.

**گریک:** هەست، هێز.

**گریل** (باک.): خلۆر. ــ بوونەوە: خلۆربوونەوە.

**گریمان:** وەهادانان، گرێمان.

**گریمانە:** بڵێمانە، لیمانە. گرێی زۆر لەبەن و دەزوودا.

**گریناى:** (هەورا.) کولاّندن.

**گرین:** گریان. ــ ژک: کەسێکی، کە زۆر بگری.

**گڕین** (باک.): تەقین. بڵێسە، هەوبوون، سووتانەوە.

**گرێنچک** (بار.): گە. گرێی قامکان.

**گرێ نییر:** گرێ و خڕی نیرییە، کە لەنێوەڕاستی تیرەکە دایە.

**گرێو:** مەرج، بارمتە، گرەو. شل. ــ کردن: مەرج کردن.

**گرێوان** (رژ.): گریان، فرمێسک ڕژتن.

**گرێوە** (رژ.): گریان.

**گرییشە** (مەنک.): تەشقەڵە، شڵتاخ.

**گز:** ئارەزوو، حەز، ئەڵها، تاسە.

**گزاف** (باد.): بەرچاوتەنگ، ڕژد، بەرجل، دەستگرتی. ــ ی: (باد.) بەرچاوتەنگی، ڕژدی.

**گزاندن:** ووزاندن.

**گزە:** تیژڕژیین. گەسک. فێڵ، ساختە.

**گزەری** (هەورا.): سێوی بن ئەرزی.

**گزەگز:** گیزەگیز، ووزەووز، دەنگ و هەستی بەرایی دەست پێکردنی نەخۆشییە. نێوی دەنگی هەڵقوڵینی ئاوێیە.

**گزەون:** ساختەچی، فێڵزان.

**گزرە** (خۆ.): گیایەکی ووشکی گێرەکراوە. کۆمەڵە دار و گیشەدارە. داری براوی بەهارێیە بۆ زستان ووشک بێتەوە. لکەداری چکۆڵەیە.

**گزرک** (هەورا.): کاڵەکی نەگەیشتوو. گرکە.

**گززە:** ووزە، گیزە.

**گزک:** گەسک.

**گزگزە:** جوورە رووەکێکە. گیایەکە گەڵایەکەی وورده و درواوییە و کە بسووتێ گزەی لێ دێت.

**گزگزین** (باک.): تەزینی دەست یا پێیە لەبەر لەسەر دانیشتنی و گرانی خستنە سەری.

**گزگل** (هەورا.، شا.): گەڵوان. (کە.) گیایەکە سەری وەکوو پەتاتە وایە.

**گزم** (خا.): دارێکی بێبەر و قایە گەڵایەکەشی وەهی هەناری دەچێ.

**گزنگ:** زەردە دەرکەوتن، زەردە، گمزەنگ، گمزینک.

**گزنی:** درۆی هەڵبەستراو، فێڵ، بوختان.

**گزۆری** (کە.): تەواوی، کەماڵ. نا ــ: ناتەواوی، دەست کورتی.

**گزی:** (هەورا.) گەسک، (شا.) فێڵ.

**گزی چار:** گەزی چار.

**گزیر:** شاگرد، کوێخای گچکە. پۆلیس. دارۆغەیی.

**گزیرتە** (باد.): گزیتە.

**گزیرخانە:** پۆلیس خانە.

**گزیری:** شاگردی، دارۆغەیی. پۆلیسی.

**گزین:** بزواندن، جوولاندنەوە.

**گزییتە:** گزیرتە، دوورگە.

**گژ:** تێک ئالان بۆ شەڕ و ناخۆشی. بەرەنگار. سست، خاو. ئاوریش. بە ـــ یەکداچوون: تێک گیران. لە ـــ: لەزگ. بە ـــ یەکدا کردن: تێک بەردان. ـــ بوون: بەرپابوون. تووڕەیی. تییژ.

**گژاڵ** (باک.): شەپۆڵ لێدان، لە گوریزەدان. گوریزە.

**گژژ:** لەوەدەمەدا دەکوترێ و دوورپات دەکرێتەوە بۆ دنەدانی گا بۆ مانگا.

**گژک:** جوورە دارێکە. کۆژەکە.

**گژکە** (ڕەوا.): چەمۆڵە بەرامبەری ڕووی یەکتری ڕاگرتن.

**گژگژاندن:** بەرپاکردن، هەڵاییساندن. بڵندکردنی بینا.

**گژگژۆک** (بار.): گژگژەک، تەرزەی وورد.

**گژگژین** (باک.): ڕاست و بڵندبوونی بینا، بەرپابوون.

**گژلۆک:** تەرزەی چکۆڵە.

**گژمراندن:** هاڕین، ووردکردن.

**گژمرین** (باک.): هاڕان، ووردکران.

**گژنەسەر:** سەرقژن.

**گژنژە** (کە.): گژنیژە.

**گژنیژ:** جوورە گیایەکە. سەری هەموو بسکەکانی دانەدانەیە. مووررووی زیو. گۆی خەنجەر و گوارانە. دەرمانێکی دەنک دەنک و زەردە لە لای عەتاران بەخەنەوە لە منداڵی ترساوی دەدەن. ڕون یا هەر چتێکی وەکوو گژنیژی دانار دانار ڕاوەستێ.

**گژنیژە:** بڕوانە: گژنیژ.

**گژوگیا:** گیا و گۆتەڵ.

**گژۆل** (باک.): جوورە دارێکە.

**گژو وێژ** (هەو.): پڕکار، خەریک، لە کارەوەجوو.

**گسک:** گەسک.

**گسی:** گەسک.

**گشت:** خشت، ڕایکەم، سەرجەم، گە، سەراپا، تەف، تەڤ، تەڤدە، دەهڤ، هەموو، خڕ، تەواو، تێکڕا، گش، گشک، تەکووز، گجا، جم. چوارلا، هەموو لایەک.

**گشتەک:** پارچەیەک لە کەوا یا کراسی ژنان دەکرێتەوە.

**گشتک** (باد.): ئەنگووتک.

**گشتی:** تەواوی، خڕی، گردی، (زا.) گشکی.

**گشک** (باک.): گشت. (سوور.) ئەنگوتکی هەویری. (شار.) چنگە زڕدایکانە، نیومست، نیوچنگ.

**گشکە:** چەمۆڵە.

**گشکی:** کشتی.

**گشگر:** هەمووی بگرێتەوە.

**گشێوش:** پانتایی هەوا.

**گغەگغ:** گمەگم. دەنگێکە، کە منداڵی ساوا گوێ دەکات. دەنگی کۆترانە لەکاتی هاتنە هێلکەدا.

**گف:** هات و هاوار و شیوەن، ترساندن بەگفت و قسە.

**گفت:** پەیمان، بەڵێن، بڕیار.

**گفتار:** گفت و گۆکردن.

**گفت و گۆ:** دەمەتەقێ. ـــ کردن: دەمەتەقین. پێکەوە ئاخافتن.

**گفکە:** گورلێنک.

**گڤ** (کە.): تووڕە، مووگرژ. ـــ بوون: تووڕەبوون. هێز، تین.

**گڤشتن** (باک.): گوشین، ڕێک گوشین.

**گڤاند** (باک.): بڵندی، بەرزی، پایەی بالاّ.

**گڤە:** دەنگی با، دڤە. نێوی دەنگی ڕۆیشتنی بەردێکە بە قۆچەقانی و نیدی ئاوێژرابێ. هاشە. ـــ گڤ: هاشەهاش، ووڕەووڕ.

**گڤرت** (باک.): کێمی خووێناوی.

**گڤزۆنەک** (باک.): ڕەژی.

**گڤک:** ڕوو، لا، کن.

**گڤن:** گرژ، تووڕە، مۆن. ـــ بوون: گرژبوون، تووڕەبوون. ـــ ی: گرژی، تووڕەیی.

**گڤی** (کر.): گرژی، مۆنی.

**گڤیژ** (باک.): گێوژ، گۆێژ.

**گڤین:** مەیین. مۆڕبوونەوە. مووڕاست بوونەوە.

**گل:** هۆزێکە لەنێو داودە و زەنگنەی لای کەرکووکێ بلاّوبوونەوە. (فە.) کەڕەت، جار، چەڵ. ڕا، هەل. چاوئێشە، ئازار. جوولانەوە. چەن ـــ: چەند جار. ـــ دانەوە: گێڕانەوە. ـــ خواردنەوە: گەڕانەوە. مەرگ، بەلاّ، ڕووشە. لە ـــ کەوتن: لەکارکەوتن، لەهێزکەوتن. (هەورا.) ژانی زۆر بەدژواری چاوان و ئیدی. ـــ کەردەی: ئێشان و ژان کردن. ـــ بوونەوە: خلۆربوونەوە. ـــ کردنەوە: خلۆرکردنەوە.

**گڵ** (هەورا.): گڕ. خۆڵ، خاک، ئاخ، زەوی هەرد. جار، چەڵ، کەڕەت. گلواز.

**گلار:** دەنکە ترێیەکی زۆرە لەبن سەبەتەیدا. ـــ او: بێ ئارام بوون لەتاو ناسازی و ناڕەحەتی. بێ ئارامی. دەردێکە ئارامی لە مرۆ ببڕێت. ـــ ە: (هەورا.) گلێنەی چاو. ـــ کۆ: کوتکی جل شووشتن.

**گلاکوتک:** کوتکی جل شووشتن.

**گلال** (زا.): گەلی، گەری، شیو. ـــ ە: (باک.) زۆر قەڵەو.

**گلاّڵە** (کە.): ئامادە، گەلاّڵە. ـــ کردن: کورتکردنەوە، کۆکردنەوە.

**گلان:** کەوتن، خلۆربوونەوە. ـــ ە خوارەوە: کەوتن. ـــ دن: خستن، خلۆرکردنەوە.

**گلاو:** ئاوەگڵ. پیس. بەپێی ئایینی ئیسلام هەرچتێکی وەسەگی تەڕ بکەوی گلاو دەبێ. ـــ کردن: ئاوەگڵ کردن. ـــ ی: خۆڵاوی، تۆزاوی. پیسی.

**گلاوه:** بەنێکی هۆنراوەوەیە لە ملی جوانوان دەکرێت.

**گلە:** گازاندە. شتی شیرین(بە زمانی منداڵان). بەو گلووە ترێیانە دەڵێن، کە هێشوو زەنگەتەکان بوویێتەوە.

**گلە:** چتی شیرین (بەزمانی منداڵان). ققە، ککە، کەکە. (فە.) قوڕ. ـ بان: خوڵبان، (خۆ.) بان براو. (هەورا.) خاکەبان. ئاخەبان، (باک.) ئاخبان. ـ جان: کانگای خوڵی سپی یا سوورە دیواری پێ سواخ دەدەن. زبڵخانە. ـ خۆرکە: کرمی گڵی. ـ سەر: جوورە قورێکی مەیلە و سوورە ژنان سەری پێ دەشۆن بۆ ئەوەی بە ئاسانی پرچیان داهێنن. ـ سوور: (بابا.) سیمکل. ـ شۆک: گڵی دۆشاو. ـ ماک: قاشۆ میێو. ـ هەرمەنی: گلە ئەرمەنی.

**گلەیی:** گازندە، گازاندە، داد، گلی، گلەه. قیرە، قیڕ. ـ کردن: گازاندەکردن. ـ کەر: گازاندۆک. بێ ـ: بە ئارام.

**گلباران:** دەرمانێکی سوورە، کە بە هۆیەوە مەڕی پێ نیشانەدار دەکەن.

**گڵپە:** گڕپە، گرفە. ـ ی ئاوری: بڵێسەی ئاگری. ـ گڵپ: گڕەگرپ، لرفەلرفی ئاگری.

**گڵتە و فڵتە** (کە.): فروفێڵ. قسەی پڕوپووچ.

**گلجانە** (باک.): گەمەیەکی منداڵانە.

**گلچ** (باک.): بژارچن. ئاسنێکە بژاری پێدەکەن. ـ ک: (باک.) بژارچنی چکۆڵە.

**گلخواردن:** گەڕانەوە، وەستان. خلۆربوونەوە. بە دەورەدا سووڕان.

**گلدانەوە:** لای خۆ هێشتنەوە. دەستندە. گەڕاندنەوە.

**گلک** (هەورا.): قامک. لاسکی گەغەشامی بێ دەنک.

**گلکەند** (هەورا.): گلکەن. گلێنجان، گلنجان.

**گلکاس:** گیایەکە بستێک بڵند دەبێ، گەڵای وەکوو تەرەتیزەیە، بن خڕ و سپییە و گرێگرێیە و بنەکەی ئی شیرینی هەیە و تاڵیشی هەیە ئەوەی شیرینە دەخورێ.

**گلکۆ** (هەورا.): گوڵکۆ. گۆڕ. جێگایەکە، کە بەردی لێ دەردەهێنن یا گڵی لێ دەکێشنەوە.

**گلگل** (باک.): گوڵە پێغەمبەرە. ـ ە: (فە.) قلپەقلپی ئاوە.

**گلگلۆلە** (هەورا.): مەزرەق.

**گلگیر** (بابا.): کەو، سەرەند، کونی لە بێژنگی و شیلگیر و هەمووان گەورەترە.

**گلمان** (ڕۆژ.): گەوزین. ـ دن (کە.): گەوزاندن. قسەجوون. ـ دنەوە: زۆرانێ و یەکتر گەوزاندنی سەگان.

**گلمە:** نەرم و خڕ، پلپلەگۆشت، ولمە. بە گۆشتی دەوری کونیش دەڵێن.

**گلمەت:** گوومتل، گووندە، (هەو.) کستەک، کەرسەک. پەل، سندە، سمتەکل. سندەگڵ. کلۆسن.

**گلملاندن** (ڕۆژ.): گەوزاندن.

**گلواز** (کۆ.): گڵ. (هەو.) گلواز. پرچی لوول.

**گلوان** (شا.): گەڵوان.

**گلوەترێ:** (شمق.) تلی تلی.

**گلوەر** (کۆ.): گرۆڵ.

**گلۆتە** (ڕەوا.): سندە ئارد یا گەنم یا پارچەیەکە لەچتی ووردی ئەم کێشراو، کە یەکتری گرتبێ. (دزە.) گلمەت، سندەگڵ.

**گلوخول:** گلان و خولان. گواستنەوە بۆ. .

**گلۆر** (ڕەوا.): خلۆر. (باک.) ئەنگوتکی هەویری. (هەورا.) گرۆڵ. پارچێک لە لاتەنیشتی کراس. (هەو.) گروێل.

**گلۆفتن:** هەڵگلۆفتن.

**گلۆکە** (خۆ.): گیایەکە بنەکەی دەکرێتە ئەسپوون.

**گلۆلە** (هەورا. کۆن): گیایەکە. گلۆلۆک.

**گلۆڵە:** بەن و دەزووی لێک ئاڵاوی خڕهەڵدراو. گرۆز. گرۆفک، گولۆک، گرۆڵە. (کە.) کەسێکە شلەپەتە بوویێت و جووڵانەوەی نەبێ، نیفلیج.

**گلۆڵۆک:** گلۆڵە.

**گلوو:** گلار، (هەورا.) گەبەل. (ڕەوا.) تریسک. (خۆ.) تلی. (خۆ. دەر.) قل قلی.

**گلووخول:** سووڕان و گل و خولبوون.

**گلووکوێز:** توانا، هێز.

**گلووک:** گوڵ. کۆی (گوڵ) ە: گوڵان.

**گلوول** (باک.): قەڵەو.

**گلووڵە:** گیایەکە.

**گلووێنە:** گولبینە. گولوینە. (هەورا.) گوولبین. (خۆ.) باکێش. ـ ئاخن: تۆپەوانە.

**گلوی** (هەورا.): گەروو.

**گلە** (باک.): گلەیی.

**گلێ:** دەنکە ترێیەک، گلە ترێ.

**گلی** (باک.) گلەیی، گازاندە. (فە.) جارێکی، چەلێکی. ـ ئان: داواکار، گلەییکار.

**گلیاز** (باک.): گێلاس.

**گلیان:** خولان، سووڕان، بزووتن. پاڵپێوەنان بۆ خولان. گلێران.

**گلێخە:** گوڵی شین و سپی دەردەکات و بە گوڵی لاولاوی دەچێ، بەڵان وەکوو وەنەوشە سەر شۆڕدەکەنەوە. سەرکەکەی دەکوڵێنن و دووایە ووشکی دەکەنەوە و هەڵیدەگرن بۆ شۆی بووزووان لەکاتی پێویستدا دووبارە دەیکوڵێننەوە. ـ بەرازە: بنەکەی بەپیشاوی لەسەر هەر قونێر یا جێگایەکی خردانرێ، بە دوو سێ جاران دەری دەکات. بکوترێت و لەنێو پەڕۆیەکی تەڕدا لەبن ئاوری بپیشێنرێت و لەسەر هەر کولکێکی دانرێ دەری دەکات.

**گلێر** (هەورا.): خلۆر. ـ بوونەوە: خلۆربوونەوە. کۆ، خڕ. ـ کردنەوە: خڕ و کۆکردنەوە. گەڵوان.

**گلێران:** پاڵ پێوەنان بۆ خلۆرکردنەوە. گلیان.

**گلێرای** (هەورا.): کەوتن.

**گلێرە** (ڕەوا.): کاڵەک و شووتی هێندەی گووێزێکی بێت. تەرزە چکۆڵە. زیپکە. ڕزەژیلکە. تەرزەلۆکە. جوورە تەرزەیەکی خڕ و ووردە جار جار لەپێش بەفریدا دەبارێت. (شا.) گولگلینکە. (کۆ.) بنگرە. (هەو.) تەرزەلووک. (دەر.) بنگرەک. (بڵ.، موک.) کەلوو. گیایەکە وەکوو

داروجان وایە بە بەرەکەشی هەر ـــ دەڵێن، کە تێکەڵی دەغڵی بێ تاڵی دەکات، تۆوەکەی دەکەلیکی وەکوو پۆلکەی وایە. گیایەکە باسکی درێژ دەبێ دەگەغی دەئاڵێ و پەلکی وورده و باریکە. ـــ ڕەشە: گیایەکە لەنێو گەغیدا شیندەبێت، تۆوەکەی وورده و ڕەشە، وەکو تۆی ڕەشکە. جیاوازی گلێرە و گلێرەڕەشە ئەوەیە، هەرچیکو و گلێرەیە تۆوەکەی لە کەلویکی درێژی وەکوو پۆلکە وایە، بەڵان نی گلێرە لە کیفێکی خڕ و سپیدایە.

**گلێرۆک** (گەر.، باد.): چتێکی خڕ و ئاوداره بە لەشی گەڵای دار مازوومەوە دەبێ. بە بەرەکەشی هەر دەڵێن ـــ .

**گلیز** (باک.): کەفی زار.

**گلیلە** (فە.): گلێنەی چاو. (باد.) چلووره.

**گلێم** (هەورا.): بووزوو، بەڕە. جووره چنراوێکی تریشە وەکوو جاجم و کەل و پەلی تێدا هەڵدەگرن.

**گلێشقا** (باد.): کرش و کاڵرێژ، زبڵچی.

**گلێنە**: ڕەشکێنەی چاو، کانی چاڤ، (کە.) گلینکە. (باک.) گووزەکاچاڤ. (موک.، بابا.) کزن. (هەورا.، باد.) گلێرەی ڕەشی نێو دەخلان. قابێکە لە گڵ دروستدەکرێت. (باک.) قافێ گولا. (شا.) مەقەلێکی گڵی و گەلێک کون کونە.

**گلینک** (فە.): خڕ.

**گڵێنجان** (کە.): جێگایەکە گڵی لێ هەڵدەکەنرێت. گڵکەند.

**گلینکە** (کە.): گلێنە.

**گمە** (هەورا.): جنۆکە.

**گمەگم**: دەنگی کۆتر و فەقێیانە. دۆغەدۆغ، گغەگغ.

**گمۆرە**: مێشورلە.

**گمێز** (هەورا.، جاف.): مێز.

**گن**: منگن، کەپۆگن، بە کەسێک دەکوترێت، کە لە قسەکردندا دەنگی لە کەپۆی دێت. ـــ ەگن: گنگاندن. بە کەپۆ قسەکردن. ـــ گناندن: بە کەپۆ قسەکردن. ـــ گنۆک: لاراندنەوەی گۆرانی.

**گنا**: زەوی، خاک.

**گنای** (هەورا.): کەوتن. ـــ ڕا: کەوتنەڕێ.

**گنج**: گرژ، گرنج، لۆچی بەرگ و پۆشاک. ـــ اوی: لۆچاوی، گرژاوی. گرنجاوی. ـــ گنج: لۆچ لۆچ، گرنج گرنج. ـــ ی: گرنجی، لۆچداری، کرژی. گنجیل. بەو موو و تووکانەی ئاژاڵان دەڵێن، کە بە ڕیخەوە ووشک دەبێتەوە.

**گنجیل**: گنجی، گرنجی، گرژی.

**گنخ**: بۆگنخ. ـــ بوون: گنخان. ـــ او: بۆنگرتوو، گەندەژە، کەندەخە. ـــ ان: گلمخان، کەرخین، گنخبوون. ـــ اندن: کەرخاندن، خراپکرن.

**گندراندن** (باک.): خلۆرکردنەوە.

**گندۆر** (باد.): کاڵەک. (هەو.) گندۆرە.

**گندۆر** (شا.): قەلەندۆر. گیایەکە دەخورێ و بۆ ڕەوانی باشە.

**گندۆش** (کە.): سوورژن، گنۆش.

**گندین** (باک.): خلۆربوونەوە.

**گنشتە**: پاشەرۆکی هەمموو چتێکییە یا گۆرانی کوتن.

**گنۆش**: سوورژن، گندۆش.

**گنێخە**: ئەستوورایی مل. (کۆ.) خینگە. (موک.) گێپەڕە.

**گنین**: بە کەپۆ قسە کردن.

**گۆ**: گوێ. ڕەگی (گۆتن). دوگمە، بشکوژ. دارێکی خڕە لە گۆیێندا بە چەوگانی لێدەدەن. بە هەمموو چتێکی دەڵێن خڕبێ. کوودە، هۆل. جوولان، هەست، هێز: دەستم لە سەرمان لە ـــ کەوتووە: بێ هەست و هێز بووە. ـــ ی مەمکی: چیچکە، چیچە، چیچلە. سەرچیچکە. لە ـــ کەوتن: بێ هەستبوون. لە ـــ چوون: سڕبوون.

**گۆبەبەک**: ئاژاوە. هەرا.

**گۆبەرۆک**: ئالان، بەرە، گۆدەڵە. خشڵێک، کە بە کەناری سەخمە و کوڵەجەوە دەدروێت.

**گۆبەن** (کە.): گۆبەند. یاری، گەمە. فێڵ.

**گۆبەند** (کە.): گۆبەن، گۆبەنگ. هەڤانی. ناز. فێڵ، وەیم. بەزم و خۆشی.

**گۆپارۆک** (ڕەو.): گیایەکی گەڵا وورده.

**گۆپاڵ** (هەورا.) کوتەک. داردەستێکی سەرخڕە، گۆچان. نێوی سەگانە. ـــ باران: بارانێکە بە ڕێژنە و توندە، کە وەکوو کۆپالی زەوی دەکوتێ.

**گۆپە**: بروانە: گۆپکە.

**گۆپک** (باک.): پۆپەی چیا. سەری خڕ هی چتی درێژ.

**گۆپکە**: گۆ. گۆپە. پشکۆژ. (کۆ.) چرۆ. گووپک. گۆپکەی دار، کە تازە دەپشکوێ.

**گۆپێتە**: چرۆ. پشکۆژ.

**گۆت** (هەورا.): گۆد. گۆج لە سەرماوە. سڕ. لە پێ کەوتن. ڕەگی کاری ڕابووردووە (گۆتن).

**گۆتە**: قسە، ووتە. ـــ گۆت: ڕنگەڕنگ، خوتەخوت. هەراهەرا، دەنگەدەنگ. زۆر گوتن.

**گۆترا**: سپێدەی بەیانی.

**گۆترە**: چتێکی، کە بە کێشان بفرۆشرێ و بەبێ کێشان بفرۆشرێ ـــ ی پێ دەڵێن. لە ـــ : لە بڕیە.

**گۆتن**: کوتن، ووتن. گۆرانی. ـــ ا مە نەچووە سەر هەق: ئێمە ڕێک نەکەوتین. ل ـــ ا خوە نایە خوار: قسەی خۆی ناگۆڕێت.

**گۆج**: دەست و پێ ئیفلیج. ڕەقیتە. گێڕ. ڕێنجۆ. ـــ ی: ئیفلیجی، گێڕی.

**گۆجار** (باک.): کۆمەڵە بەرد، کەڵەکە بەرد.

**گۆجەبەر**: کۆچەر. ـــ ی: کۆچەری.

**گۆجکردن**: ژەک. بە منداڵ یا بێچووی تازە بوودان.

**گۆرج**: ژەک، فرچک.

**گۆچان**: کۆپاڵ، هەچک، قەلانک، چەوگان، هەچی، گالۆکە، چیو. چەم. دارلۆف. ـــ ی چکۆڵە: تالوول.

**گۆچبەر**: کۆچبەر.

**گۆچەوەنی**: سوورژن. سۆزن، (فە.) زەن.

**گۆد**: سڕ. گێڕ. (هەورا.) گۆت. لە ـــ کەوتن: سڕبوون. ـــ یش: جووره گیایەکە.

**گۆدیله:** کاکۆڵ.

**گۆر:** نێچیر. گۆلەکە. تەمەن (بۆ مانگا). دووا، پاش.

**گۆڕ:** کلکۆ، نارامگە. پانایی، جێگەی پان و بەرین. ــ لێگرتن: قازانجێکی زۆر چەنگ خستن. شایان. بافت. ــ خانە: قەبرستان، گۆڕستان.

**گۆران:** نێوی خێڵێکی گەورەی کوردە. لەوەرگەی هاوینییە. جەردە، ڕێگر، چەتە. (فە.) ــ چی: گۆرانی بێژ. ــ ی: شێوەزاری تیرەی گۆران، جوورە مەقام و بەستەیە. تەرانە، سترین، دیلانە. ــ ی گوتن: ستراندن. ــ ی بێژ: چرگەر، دەنگخۆش، دەنگبێژ. ــ یەی دارتنک: لە سەدەی چواردەمدا بە گۆرانی ئێستایان کوتووە.

**گۆڕان:** گۆڕین، لە بارێکەوە بۆ بارێکی دی چوون. (هەورا.) واڕپای. ــ ی یەکسا: گۆڕانی بەرامبەر. ــ ی پێچا: گۆڕانی پێچەوانە.

**گۆراو:** دژیەکە ئاوی زۆربێ. دژی ڕوون.

**گۆڕاو:** بەقم، تێکچوو. (باک.) بوڕەنگە. گۆڕانی بار.

**گۆره** (سوور.، باک.) : گۆرەوی. (باک.) ــ بەند: گۆرەوی بەند. ــ مژ: چێڵێکی بمژێ. ــ یی: گۆرەوی. ــ کە: گۆرێلک. ــ ماست: جوورە ماستێکە شووان لەگەڵ خۆی دەگێرێت و تامی لە ماستی دی ناچێت.

**گۆڕەپان:** مەیدان. گۆڕ و دەشتێکی پانە. تەختایی زەوی.

**گۆڕەوشار:** ئازار، ئەشکەنجە.

**گۆرەوی:** گۆرڤا، گۆری، گۆرەبی، گۆریە. ــ ئەژنۆیان: زەنگاڵ. (موک.) ــ چنە: باڵندەیەکە ئەوەندەی کەوێکە سینگی زەردە پشتی شین دەنوێنێ و دەنگی ئێجگار زۆر خۆشە، هێلانەی وەکو جۆلانە بە دارانەوە هەڵواسراوە. گۆریا.

گۆرەوی

**گۆرەوی بەند:** گۆرەبەند.

**گۆڕەویلک:** گۆڕهەڵکەنە.

**گۆریا:** گۆرەوی، گۆری.

**گۆڕیێن:** گورلبێن، گورلوێنە، گلۆێنە. کونی تەندوور بۆ هەناسە.

**گۆرت** (ئەمە.، شکا.) : بۆ گۆڕی فەلان بەکاردەبرێ. (باک.) شیری کۆن، تیغی کۆنە. (کە.) ــ ە: هۆنراوە. (کە.) گوردم.

**گوردەگ** (دزە.) : سەگی کووێ نەبڕاوە.

**گوردم** (کە.) : هۆنراوەوە.

**گۆردی** (شن.) : هێز، تین، قووڵ. (هە.) نیشانەیەکی بزنانە، بزنی گوێ شۆڕە.

**گۆرز** (باک.) : گیایی.

**گۆرسان:** گۆڕستان.

**گۆرڤا** (هەورا.) : گۆرەوی.

**گۆرک** (دزە.) : ئاورگ، ئاگردان، (هەورا.) کووانوو.

**گوركە:** ئاورگ.

**گۆرکە** (دزە.) : (دزە.) گۆرک. ئاورگ، ئاوردان.

**گۆرکەنک:** گۆڕهەڵکەنە.

**گۆرگەنگ** (زەن.) : گۆڕهەڵکەنە.

**گۆرگەلۆقە:** جوورە غاردانێکە بە لۆقەلۆق. (خۆ.) لۆترە.

**گۆرم** (باک.) : خوشکی ژنی، ژن خوشک.

**گۆرمزە:** خەرتەلە. (سوور.) چووزرکە. گوڵی شینە و چکۆڵەیە. گیایەکە بە شینی دروواویە پشتێندێک درێژ دەبێ و گەڵای سێ قامک پانە، بنەکەی ۳۰ ــ ٤٠ لکێکی بە زەویدا پاندەبێتەوە و بە کوتراوی لەسەر هەر برین و قونێرێک دابنرێت دەری دەکات. دەڵێن بۆ مارانگەز تووش زۆر باشە. بە ڕۆنەوە دەخورێ.

**گۆڕوا:** گۆرەوی.

**گۆڕهەڵکەنە:** (ڕۆژ.) سیاگوش. پشیلەی کێوی. (ڕەوا.) گۆڕەویلک، (زەن.) گۆرگەنک.

**گۆڕی:** قوربان. خۆڵە پێناونان. ئەز ــ ی: ئەمن قوربانت بم، من قوربان. گۆرەوی.

**گۆڕیان** (کە.) : هۆنین. گۆرین.

**گۆڕیاو** (کە.) : هۆنراو.

**گۆریە** (ڕۆژ.، شەبە.) : گۆرەوی.

**گۆڕیچە:** ئەو جێگە تەنگەیە لە گۆڕیدا، کە مردووی تێدا دەنێژرێت.

**گۆریچنە** (موک.) : باڵندەیەکە هێلانەکەی وەکو گۆرەوی وایە و بەو دارانەوە شۆڕدەبێتەوە.

**گۆڕین:** گۆڕینەوە، گوهرین، گوهراندن. باسکراو، ناوبراو، بێژن. کابرا، هەرامە، وانێک. ــ ەوە: ئاڵوگۆڕکردن. گوهارتۆ.

**گۆڕینگە:** شوێنی گۆڕینی پارە.

**گۆز:** گوێز.

**گۆزانە:** جوورە ترێیە.

**گۆزانەوە:** گوێزرانەوە، گوێزانەوە. لاواندنەوەی منداڵان.

**گۆزاندن:** گوێزتنەوە. لاواندنەوەی منداڵان.

**گۆزە:** گۆزەلەی گەورە. ئاقلینە. ــ بانە: گوێزەبانە. ــ ک: گوێزینگ، گووزەک. (کە.) ــ کوت: سووالەت. ــ لە: گۆزەی بچکۆلە. ــ هەنگ: شانەی هەنگ.

گۆزک

**گوزژنیر** (باک.) : کەشکە ئەژنۆ.

**گۆزک** (باک.) : قۆزاخەی لۆکە.

**گۆزلبەس** (باک.) : کولێرەیەکە بە هەنگوین و گوێز دروست دەکرێت.

**گۆزیانەوە:** گوێزانەوە.

**گۆزینگ** (باک.) : گوێزینگ. قاپی پێ.

**گۆسان** (باک.) : زیندەوەر.

**گۆسپەند** (لو.) : مەڕ.

**گۆست** (باک.) : باڵندەیەکە.

**گۆسرمە** (کە.) : بەڵا، ڕووشە.

**گۆسکە** (کۆ.) : لوولێنە.

**گۆش** (کە.) : گوێ. گۆچ. پەروەردە بە ژەک.

**گۆشە:** سوچ، قورنە، قوژبن. ئەو ماوەیەیە، کە دەکەوێتە نێوان دوو تیشک (لە ماتماتیک)*.

**گۆشەک** (هەورا.) : مەلاشوو. ــ دار: هەر چتێکی سوچی هەبێت.

**گۆشەنشین:** گۆشەگیر.

**گۆشەوارە:** گوارە.

**گۆشت:** ئەو نەرمایییەیە کە کەوتۆتە ژێر پێستی گیانلەبەرانەوە؛ لەشی گیانلەبەران پێک هاتووە لە گۆشت، ئێسک، خوێن و ئیتر.*

**گۆشتاو:** شۆرباو.

**گۆشتەزوونە:** ئەو گۆشتەیە، کە لە برینی ئێزیک لە چاک بوونەوە پەیدادەبێ.

**گۆشتەگیر** (سورر.): کەسێکە لە زۆرخانەدا سەرکەوتوو و پێشکەوتوو بێ.

**گۆشت پارە:** ئەو خوێنەیە، کە ڕەق دەبێت و دەبێت بە گۆشت لە جێگایەکی لەشیدا.

**گۆشت تاڵ:** ئێسک گران، ڕەزا قورس.

**گۆشتخۆر:** بەو جانەوەرە دەگوترێت، کە گۆشت دەخوات.

**گۆشتن:** قەڵەو، پڕگۆشت. تێرگۆشت.

**گۆشتی** (باک.): گۆشتی سوێر و ووشکراوە.

**گۆش سووک** (کە.): گوێ سووک.

**گۆشک** (باک.): گێوژ.

**گۆشکیرە:** سەرینی بچکۆلە.

**گۆشێ** (هە.): دیزە.

**گۆفک:** ڕەحەتی نەفتی و ئی دیکە.

**گۆفیزک** (باک.): خێزماڵ.

**گۆڤ** (وان.، زا.، باک.): هۆڵی مەڕانە.

**گۆڤەند** (باک.، ئەه.، زا.، شکا.): زەماوەند، داوەت، شایی، هەڵپەرکێ. ـــ گرتن: هەڵپەڕین. کەتن ـــ ێ: چوونە نێو هەڵپەڕینێوە.

**گۆک** (باک.): گۆگ.

**گوکەفجک** (باک.): بزنێکە گوێی درێژ و قیت و قوڵ بێ.

**گۆگ** (باک.): تۆپێن، تۆپ تۆپانێ.

**گۆگەم:** گیایەکە گوڵەکانی وەکو فنجانییە و تا دوو بەژنان بڵند دەبێ، کە بە ووردی لەگەڵ ئاوی لۆرک و هەویری پارچەپارچە لە گۆمی باوێژرێ ماسیان دەکوژێت. بە زەردکراوی لە جێگای بادار بنرێ، زۆر باشە و بە کوتراویش بۆ گرێ و قونێرانی مرۆ و ماڵاتان باشە، دەری دەکات یا دەیڕەوێنێتەوە.

**گۆگرد:** کانێکی زەردە و بۆ چارەکردنی نەخۆشیانیش بەکاردێت.

**گۆل** (مرک.): پەنگاو، پەنگاڤ. گۆلی ئاوێ، دەریاچە، گۆم. (خۆ.) دێراو، (خۆ.) بۆ، (ڕەوا.) باو، (هەورا.) گۆلم. ـــ ە: گوێلک.

**گۆڵ:** خاڵ یا ئەو نیشانەیەیە، کە دەکەوێتە سەر لەش و کەل و پەل. ووشەیەکە واتای ئێرە و پتر بەو ووشانەوە دەنووسێت: گۆڵسەگ، گۆڵەکەر. تەفرە، لەخشتەبردن.

**گۆلاو:** گۆل، ڕفکە، ئەستێرە، پەنگاو، پەنگاڤ. (ڕۆژ.) جەردام.

**گۆڵە:** هەزارە، شۆڤک، شوورک. شمشیرە، شەوژەن. پشتەک، چلمیرە. دەردێکە تووشی زمانی ڕەشەوولاخان دەبێ. گرمە. _ گۆڵ: گرمەگرم.

**گۆڵبن عەرد:** دارێکە بەقەد ئی گوڵی گولاوی دەچێ.

**گۆڵسەگ:** گەماڵ، گەمبۆڵ. ـــ کەر: ئێرەکەر.

**گولپ** (باک.): قوم، مژەک.

**گۆلتک** (باک.): حەوز، ڕفکە، ئەستێرک. ئاڤەڤەک.

**گۆلک** (باک.): گۆلکی یەک ساڵانەیە. گوویلک.

**گۆڵک** (هەو.): گوویلک، (بابا.) گوێرەکە.

**گۆلکڤان** (باک.): گوێلکەوان.

**گۆلکگوڵ** (کە.): ڕەنگاوە بە خاڵ و گوڵ.

**گۆڵم** (شن.): گۆل، لووێچ، گوێل. مست. پڕبەدەستێکی ئاوەڵە. ـــ ە: گۆشتی نەرمە. (هەورا.) ـــ مز: گاڵتە، فشە، گەمە.

**گولنگ:** گۆلینک.

**گۆلوازە:** قسەی جووان، واژەی پشکووتوو.

**گۆلیە:** کەروو، گەلوو.

**گۆلیزە:** تەنگوچەڵەمە.

**گۆلی گۆلی:** (دەر.) گۆلەگۆلە. گۆلکی پێ بانگ دەکرێت.

**گۆم:** گۆماو. گۆمی ئاوێ. گۆل، دەریاچە. کونێکە لەنێو هەورێکی گەورەدا، کە ئاسمانی تێدا شین بکاتەوە.

**گۆماو** (باک.): چاڵایی لە چەمدا.

**گۆن** (باک.): ڕەنگ. دیمن.

**گۆنا** (هەورا.، جا.): کوڵمە. (باد.) لام. (کە.) ـــ گۆن: هەمەڕەنگ.

**گۆنە** (باک.): ڕەگ، ڕیشە. بێ هەستکردن.

**گۆنەر** (ڕەوا.): کەژ، پشکساڵ. (ش.) گۆنەڵ، گۆنگەڵ. هەرەت، هاڤرۆنگ.

**گۆنەڵ** (ش.): گۆنەر، کەژ.

**گۆنج** (باک.): ڕیشە.

**گۆنک** (باک.): گیایەکە.

**گۆنگ:** پۆشراو، نەناسراو، نەزانراو، نادیار.

**گۆنگە:** (بابا.) گوونج. لوولەی سوورەوە کراوە لە گڵی بۆ ئاو بەژێر خاکدا بردن.

**گۆنگەڵ:** ئاسیو، هەنگامە، رووشە، (ش.) هێڵ. هەوان. گۆنەر. هەرەت. گۆنگەر.

**گۆنگڵ** (باک.): ئاودان و ئالقەدارکردن بۆ پرچ گوریزەکردن. گاڵتە جاری.

**گۆنیا:** سێ گۆشەی گۆشە وەستاو.

**گۆوەند:** داوەت، ڕەشبەڵەک، زەماوەند.

**گۆهتن** (باک.): کوتن، گۆتن.

**گۆوان** (فە.): دەست لە برین و کولکی لەش وەردان دەگووێ. گندۆرە و هەرمێ و چتی تر زۆری دەست لێ بدرێ نەرم و بڵ دەبێ.

**گۆی زەوی:** خڕکەی زەوی.

**گۆیا:** گوایە.

**گۆیژ** (باب.، کە.): گێوژ.

**گۆیش** (باک.): زاراوە، فرێز.

**گۆی مەمک**: گۆپکە مەمک، (ڕەوا.) چیچیلە، (باد.) چچک.

**گۆیی**: خڕی. هۆزێکی کوردە نیوەی کەوتۆتە کوردستانی عێراق و نیوەشی کەوتۆتە ژێر دەستی ترکانەوە.

**گۆیێن**: یاری بە داردەست، گۆچان کردن. شەقێن.

**گۆیین** (باک.): باڵندەیەکە شەوان بێدارە. گۆرین.

**گو**: پیسایی مرۆیان. ـــ او: ئاوی پیسی ئاودەست، گوویاو، نزاوی گوو. (بابا.) ژاکاو، گووراو، ژاکاوی لەش و بەدەن. (شن.) هەنگواو. شلەژاو. ـــ اوی: پیس، بەگوو. لە گووەوە وەردراو.

**گوارە**: (فە.) گوشخارە. گۆشەوارە، گووهار، گۆشیار. (خۆ.) گوارکە. (ڕەوا.) زەنگەتە ترێ. (هەورا.) گواری.

**گوازتنەوە** (هەو.): گوێزتنەوە.

**گوان**: مەمکی مانگاو گامێش و ئاژاڵانی مێینە. نەرم بوون بە گوشین، برینەکە گوارە: نەرم بووە. پتربوون، دەین دان. ـــ دار: خاوەن گوان.

**گونەستێرە**: گوهەستیرک، ئەستێرەیەکە ڕادەکشێ، گوڵەستێرە. جوورە مێشێکە ڕەنگاوڕەنگە و بەشەو پاشەڵی دەدرەوشێتەوە.

**گووپ**: لام، گیپش. نێوزارە کە بە فوو یا چتێ دی پێستی ڕوومەتی هەڵبامسێ. ـــ ن: گووربن، گیپش ئەستوور.

**گووتک** (سوور.): ئەنگووتک.

**گووتل** (باک.): ڕێککوشێن. ـــ کرن: ئازاردان.

**گووتن**: کوتن.

**گووجیلە** (بار.): کوردەڵە. فەرخەبەراز، بزلەبەراز. (موک.) بێچوەسەگ، تووتکەسەگ، (باک.) بۆچک، گجوولە.

**گووچ**: ئازار. (سوور.، شکا.، نەه.) ناخۆش، گران، کز.

**گووچانگر** (دزە.): سێ کوچکەی بەرد.

**گووچانی** (دەر.): سێ کوچکەی بەرد.

**گووچک** (باد.): گوێ، گوێچکە.

**گوودلە** (هەورا.): کاکۆڵ، توالێت، پەرچەم.

**گوودیلە** (ڕۆژ.): بڕوانە: گوودلە.

**گوور** (باک.): گوورگ. بیروباوەڕ.

**گووڕ**: تاو، بەخت، گوژم، هێز. بە ـــ: بە سەختی، بە پەلە. بێ ـــ: بێ هێز. ـــ ی باران: تەوژم.

**گوور** (فە.): گوێلک.

**گووراز**: بەراز.

**گووران**: پێگەیشتن. داماڵرانی پێست. ڕسکان. ـــ اندن: داماڵین. هاڕاندن. سەربڕین. تێخوڕین، ڕاخوڕین، گوورژاندن. ـــ ی: فراوانی، زۆری، چەندی.

**گووراوا**: گوواو. (ش.) گۆڕەوی.

**گوورە** (کە.): هەرا هەرا. گوورژین. هاڕە، دەنگی فرۆک و بەمزۆک. هەرمشە.

**گووڕە** (خۆ.) خۆلە ـــ نەبردن: خۆنەشێواندن، خۆ سل نەکردن و وسەرخۆنەهێنان.

**گووڕەشە**: گووڕە، هەڕەشە.

**گورەگوڕ**: گرەگر، گراگر، بڕەبڕ، هاڕەهاڕ. ـــ کردن: گوڕژین.

**گوریە** (باک.): مێش هەنگوین.

**گوریز** (کە.): گورج. چالاک.

**گوریک** (باک.): مێش هەنگوین.

**گوریزە**: بەکەیف. بەسبوون.

**گوڕپ**: سەرکردنەسەر ئەژنۆ. ـــ ن: خڕین، گوپن، ڕووپڕ و قەڵەو.

**گوربە**: پشیلەی نێر.

**گورت**: شەمچە. (باد.) گۆگرت.

**گورج**: چاپووک، وریا، دەست بەجێ، خرپ، توند، لەز. توندوتۆڵ. ـــ وگۆڵ: توندوتۆڵ، چەسپان. خێرا. ـــ ی: خێرایی، جم و جۆڵی.

**گورچە** (فە.): گورچیلە. ـــ ویلە.

**گورچک**: گورچیلە، گورچە.

**گورچلک**: گورچە، گورچیلە، گورچک.

**گورچیلە**: گورچە، گورچک، گورچلک، گورچیلک.

**گورد**: چوست، پاڵەوان. نێوی پیاوانە.

**گوردە**: تووڵ، بەش. گورد، ئازا، پاڵەوان. لە بنچینەدا کورد لە گورد یا کورد لەوە وەرگیراوە.

**گوردی بەش** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ بێ، ڕووی چەند خەتێکی سپی تێدا بێ و لەشی ڕەش بێ یا نێوچاوانی سپی بێ.

**گوردی پۆش** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ و سەر و لەشی سپی بێ.

**گوردی ڕەش** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ و سەر و لەشی ڕەش بێ.

**گوردی ڕەش بەش** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ بێ و لەشی ڕەش و نێوچاوانی سپی بێ.

**گوردی سپی** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ و سەر و لەشی سپی بێ.

**گوردی سوور** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ و سەر و لەشی سوور بێ.

**گوردی شین** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ و سەر و لەشی شین بێ.

**گوردی شین بەش** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ بێ و لەشی شین و نێوچاوانی سپی بێ.

**گوردی کار بەش** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ بێ و گچکە بێ و ڕەش بێ، بەڵام ئاوەندیان زەرد بێ.

**گوردی مز بەش** (هەر.): بزنێکە گوێیەکانی شۆڕ بێ وە دەم و لووتی سپی بێ.

**گوڕاو** (کە.): گووڕاوی پێست، داماڵراوی پێست.

**گورز**: کوتەک. دار، ئاسن یا گوریسێکە سەرێکی خڕ بێ شەڕی پێ دەکرێ. (باک.) دەستە، بەستە، دەسک. ـــ ە: باقەی گەورە. (باک.) ـــ ک: کۆڵی چکۆڵە.

**گورزەلانێ** (هەو.): گەمەیەکە منداڵان لە تۆپە گیایەکی بەنێکی تێدەخەن و گەمەی پێدەکەن.

**گورزەهۆن** (کە.): جوورە هۆنینەوەیەکی خڕە، زۆرتر بۆ قۆچەقانی و سەرڕەشمە بەکاردەبرێ.

**گورزۆڵە** (هەو.): بڕوانە: گورزەلانێ.

**گوورز و بن مێخی** (کە.): جووره گەمەیەکی کوردەوارییە، یەکێ لە یاریکەران گوریسێکی درێژی بەدەستەوەیە بە دەوری خۆیدا دەسووڕێ، کە لە هەڵمەت و هێنەرەکان بدا، ئەوانیش بە گوورزەوە بۆی دێن و لێی دەدەن، تا یەکێکیان دەدزڕێنێ.

**گوورزوقاپ**: جووره گەمەیەکە.

**گوورژاندن** (باک.): گوراندن.

**گوورزوگۆن** (کە.): بڕوانە: گوورزەهۆن.

**گوورژین**: بۆڵەبۆڵ، گوڕەگوڕە.

**گوزۆلانێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانە بە گوورزۆنە.

**گورگ**: ئەرف، وەرگ، گورگوری.

**گورگانە شەوێ** (کە.): گۆرانی لای لایەی دایکە بۆ نواندنی منداڵ.

**گورگانخوارد** (کە.): ئەوەی دڕندە (گورگ) لێ خواردبێ.

**گوورزوگولینگ**: گیرزوگونک.

**گورگە**: گیایەکی گوڵ شینە لە نێو توو تنی شین دەبێ ووشکی دەکات. (باد.) کەڵە. حییشکە. دەردێکە گرۆیی ماڵاتانە و ئاژاڵانە، ناوی دارکی توو تنی تێدرێ چاک دەبێتەوە. (موک.) کوێرووی دەغڵییە. (بابا.، دەر.، کۆ.، هەو.) پاسار، بەرازە، سەرسووانە. ئەو دارە باریکە یا ئەستوورانەیە، کە لەسەر کووی سووانان دادەنرێت.

**گورگ ئاور**: ئاوڕدانەوە بۆ دواوە وەکو گورگی. لەکاتی هەڵاتنێدا ئاوڕدانەوە.

**گورگەخەو**: خەوی سووک.

**گورگەمزێ**: بارانێکە لە هەتاویدا ببارێ.

**گورگەلۆقە**: گوورلۆق. بە تێرخە غاردان. بۆ مرۆ و پێرژیانە.

**گورگ نەخۆرە**: پارچەیەکە لە وورگی ئاژاڵ هێندە لۆچدار و پیسە گۆیا گورگیش نایخوا. (هەورا.) حەوت لۆ.

**گورگ و مێش**: سەر لەبەیانی ڕاست، سەر لەبانی ناڕاست. بێچووی دووڕەگە.

**گووڕگووڕ** (باک.): گووڕەگووڕی هەور و مرۆیان.

**گوورلۆق** (باک.): ڕەوتی وولاخ، جووری ڕۆیشتنی وولاخ. گورگە لۆقە.

**گوورمێن**: گرفە.

**گوورمک** (باک.): کۆتایی شان.

**گوورن** (باک.): هێشووی چکۆلە.

**گوورنەبەش** (باک.): نزم، ناقابل، ناشایەن، پەست.

**گووروون**: گرووتن، کەوڵکردنی ئاژەڵ و ئیتر بە جوورێکی، کە بۆ هەمبانە و مەشکە و ئیتر دەست بدات.

**گوورنیک** (باک.): هەلاجی و شانەکردن.

**گووروان**: گروان.

**گووروانن**: گرواندن.

**گوورۆز** (باک.): نارەقچن (کڵاو).

**گوورو**: گرێ.

**گووروون**: گرواندن، داڕنینی پێست.

**گوری** (موک.): ئاور، نێو. ـــ دار: گۆنگل، ئاودار.

**گوری** (باد.، خۆ.): گڕی ئاوریەیە. (باک.) گڕی ئاوری. گورگ. (هەو.) گولی.

**گووریژە**: (هەورا.) گڕژ. پرچی قەفقەف. (کۆ.) کرووژ.

**گوریس**: پەتک، پەتی درێژ.

**گوریخ** (باک.): بەهێز و قایم و پتەو.

**گوریزە**: کرووزە، لوول، گژاڵ، قەفقەف و شەپۆلی پرچ.

**گوریژن** (خۆ.): چریکە.

**گوریسە جوو**: جووره کرمێکی نێو زگە تا ٦٠ مەتر درێژ دەبێ.

**گورین** (کە.): داڕنران. پێست دەرهێنان.

**گورینگ** (هەورا.): پلە گۆشتێکە لەناو لەشی شەرمی ئافرەت و مایندا، کە جێی مایەی زگی پڕبێ، کە ببڕێ ئەو جار زگ دەکات.

**گووزوو** (باک.): دون، چەوری، پیو.

**گووزووز** (باک.): هێلانە دروستکردن.

**گووزینە**: چۆلەکەیەکی لەش سپی و سەر ڕەشە، هێندەی چۆلەکەیەکیە، بەڵام باریک و کلک درێژە.

**گووزیری**: تەواوی. نا ـــ: ناتەواوی، دەست کورتی.

**گۆژ** (باک.): ئێستا، وێستا، نهۆ.

**گووژ**: گێوژ.

**گووژاک**: گووژاڵک.

**گووژاڵک**: گووژاک. گێژەڵۆک، کاڵەکەمارانە. گیایەکی کێوی و هاوینییە بە برکە و گەڵا و بەرەوە هەر وە شووتی دەچێ، بەرەکەی هێندەی نارنجێکی لێ دێ و زەرد دەبێ و دوو جوورن: نێرە و مێیە.

**گووژان** (خۆ.): گیایەکە.

**گووژە**: عەنزەروت.

**گوژم** (جا.، بابا.): گوڕ، بەهێز و گوڕەوە. پەلە، تالووکە، تاو. بە ـــ: بە پەلە. بە تالووکە، بە تاو. ـــ ە: تالووکە، بە پەلە، لە لێدانیدا. زۆر لە زیانێدا. (هەورا.) هێز، توند، کشان، لە بازدانی سێ باز و ئیدیدا مرۆ بکشێتە دواوە و ئەوجا غاردات بۆ بازدانێ. (شا.) مێوژی ڕەش و کاکڵی گوێز و قەزوان پێکەوە دەکوترێن و دەکرێنە هەویر لە زستانێدا زۆر خۆشە. ـــ ە تر: زیاتر، زێتر، پتر.

**گوژێن** (باک.): بە هێدی و لەسەرەخۆ بانگکردن.

**گووسە** (باک.): ڕاگر.

**گووسەگ** (کە.): گووی سەگی.

**گووست** (خۆ.): قامک، (باک.) ـــ ک: گوستیلک، ئەنگوستیلەی قامکانە.

**گوستاخ** (هەورا.، کۆ.): ئازا، تەردەست. ـــ ی: ئازایی، تەردەستی.

**گوستان**: نێوی ئافرەتانە (لە گوڵستانەوەیە).

**گوستێرک** (باد.): کرمێکی سوورە، کە گەورە بوو وەکو مێروولەیەکی باڵداری لێ دێ و باڵی دەردەکات و بەشەو لەلای قوونییەوە ڕووناکی دەدات. گووئەستێرە.

**گوستیله** (خۆ.): ئەنگوستیلە.

**گوستیلک:** ئەنگوستیلە.

گوستیلک

**گوش** (کە.): گورنیە. (هەو.) تەلیس. (فە.) گووێ. جوورە گیایەکە. (فە.) ـــ خارە: گوارە.

**گوشاد:** فراوان، بەراوەڵە، راهی، بەر بەرەلا، بەرفەکری. شادی، خۆشی.

**گوشت** (باد.): ئەنگوتک.

**گوشران:** (کە.) ووشران.

**گوشان:** گوشین، تلیت، نان لەنێو شۆرباو کردن.

**گوشراو:** گوشاو، گوشیاگ.

**گوشگوش** (باک.): هاشە و دەنگی شەپۆلی ئاوێیە.

**گووشل** (کە.): رەوان، زک رژیو.

**گوشیاگ:** گوشراو، گوشاو.

**گووشی:** هێشوو.

**گووشیلە:** تەختەتیرە، تەختەساف.

**گوشمە:** (بار.) کوشمە: قەزوان و مێووژی کوتراوە، کە کرابێتە سەلک بۆ خواردن. کە قەزوان بە تەنهاش بکوترێ و کرابێتە سەلک هەر گوشمەی پێدەڵێن.

**گوشین:** کوشین، گوشان.

**گوشینە** (کە.): تەلیس.

**گووفەک** (هەو.): سەرگوویلک، سەرانگوویلک، گووفک.

**گوفتۆگۆ:** ئاخافتن. گفتوگۆ.

**گووفک** (سوور.): گوولێنک.

**گووفیچک** (باک.): ئالقەی زولفە لەسەر نێوچاوان و لاجانگ و روومەتان.

**گووفین** (باک.): ددان لە چیرەوە بردن. مەیین. توند بوون.

**گووگلێنکە** (شا.): بنگرە. گلێرە، تەرزەی وورد، پێشرەوی بەفرێیە.

**گووگەرین:** قالۆچەی گورگلێن.

**گول:** گوڵ، خونچەی پشکوتوو، چیچەک. (گەر.) بەلوەشین. دووزام. (کۆ.) پیسک، کۆڵەبنە. ـــ ا سبحانێ: زرێبارێکی گەورەیە لە هەرێمی رانیێ. ـــ ا هەسانێ: زرێبارێکە لە سەر چیای رەشکێیە. ـــ ا ئاڤێ: گوڵی گولاوێ. (باک.) ـــ کە هرکا: گوڵی سپی. ـــ ا رۆژێ: گوڵێکی سوورە.

**گوڵ:** گول، خونچەی پشکوتوو، چیچەک، گولووک، گڵووک، گولیک، کولیلک، گلووک، گولەک. نەترک. ـــ او: ئاوی گوڵ، گولاڤ. ـــ ی: پەمبەیی، پەمەیی.

گوڵ

**گولات** (باک.): پارچە زەوییەکی رەقە.

**گولابی** (هەکا.، باد.): تووکی سەری منداڵانە لەنێوانی روومەت و گوێدا، کە لە دێهاتاندا ناتراشێ. تەمەریشی پێدەڵێن.

**گوڵابەتوون:** گولاباتوون. سیم و شریت و قەیتانی ئاوریشمە، کە لەلای ژنانی موکریان پەراوێزی جلانی پێ دەرازێننەوە.

**گولالە** (هەورا.): چکۆلە، گچکە.

**گولاڵە:** نێوی ئافرەتانە. ـــ سوورە: گوڵەنیسان، گوڵەمیلاق.

**گولاڵی** (هەورا.): گولان.

**گولامت** (باک.): گیشە.

**گولان** (رۆژ.): مەرمەڕین، گەمەیەکە بە گولە دەکرێت.

**گوڵان:** مانگی دووەمی ساڵی کوردییە.

**گوڵاودان:** شووشەی گوڵاوێ.

**گوڵاوپاش:** دەفرێکی مل باریکە، گوڵاوی تێدەکەن و لێوەی دەپرژێنن.

**گوللە:** بەرێ تفنگی، گوولە. یەرک، دەقانە. ـــ بارانکردن: بە گوللان داگرتن. گار، گوللوو.

**گوڵەئەتڵەسی:** گوڵێکی سپی و بۆر و سوور و بۆنخۆشە وەکو لاولاوی وایە.

**گوڵ ئەندام:** گوڵندام. نێوی ئافرەتانە.

**گوڵەئەستێرە:** گوڵێکی بێ بۆن و شینە و سپییە. ئەستێرەیەکیشە، ئەستیرۆک.

**گوڵەباخ:** دارێک بەژنێک بڵندتر دەبێ، لک و پۆپی زۆرە، گوڵەکەی زەرد و سوورێکە سپی دەروانێ، گولاوی هەرە باش و بۆندار لەو دروستدەکرێ. نێوی ئافرەتانە.

**گوڵەباخی هەمیشەیی:** ئەشرەفی وەکو گوڵی گوڵاوی وایە و بۆن خۆشە.

**گوڵەبان:** بەلەزی، گوڵەپەمۆ.

**گوڵەبەرۆژە:** (رۆژ.) گوڵابەربرۆژ، گوڵ بەرۆژ، (هەورا.) روجیار پەرس.

**گوڵەبن عەرد:** گوڵی سێوی بن ئەردییە.

**گوڵەپرووزە** (جا.): قەرەخەرمان، زووەردە.

**گوڵەپرۆنە:** گوڵە بە رۆنە. گوڵێکی زەردە و بۆنی خۆشە و بە مەشکەیەوە هەڵیدەواسن بۆ ئەوەی رۆنی زۆر بێت.

**گوڵەپەرێزە:** گیایەکە گوڵی رەنگاو رەنگ جوان دێنێ و پەڕی گوڵەکە و لاسکەکەی هەمووی خاڵخاڵن و خاڵدارن.

**گوڵەپەمۆ:** پەلەزی.

**گوڵەپزێن:** شەست تیر.

**گوڵەپێغەمبەرە:** گەنمەشامی، گەنمۆک، گوڵەدان.

گوڵەپێغەمبەرە

**گوڵەتەلەمە:** گوڵچیچک.

**گوڵەجوتێرە:** گیایەکی پاییزییە، گەڵای نییە و هەر گوڵەو وە گەزیزەی دەچێ.

**گوڵەخشخاش:** چارەچەقیلە.

**گوڵەدان** (پز.): گوڵەپێغەمبەرە، گەنمەشامی.

**گوڵەداودی:** گوڵێکی بۆنخۆشی پاییزییە و قارەیەکی مەیلە و سوورە.

**گوڵەرەز:** گوڵی گوڵاوێ، گوڵەباخ.

**گوڵە رۆنە:** گوڵە بە رۆنە، بۆنی زۆر خۆشە و زۆر توندە، لەگەڵ گوڵی هەلاڵەی بکرێتە چرک بۆ برینان زۆر باشە.

**گوڵەزەرد:** نێوی گوڵێکە، نێوی ئافرەتانە.

**گوڵەزەن:** یەکێکە لە کەرەستەی جۆڵایان. دارێکە وەکو تەشی (ئی جۆڵایانە).

**گوڵەسەعات:** گوڵێکی سپی وشین و بێ بۆنە. (کۆ.) گوڵە دەرزیلە.

**گوڵەشلێر:** گوڵێکی سوور و تۆپ و کێوییە. گوڵ بزن.

**گوڵەک**: دێیەکە نێزیکی هەریرێ.

**گوڵەکیە**: گوڵەپێغەمبەرە.

**گوڵەکەتان**: کەتان، گیایە.

**گوڵەگەنم**: هۆشە، (باک.) ووشی.

**گوڵەمەخمەری**: گوڵێکی مەخمەری و زەرد و سوورە.

**گوڵەمۆرە**: ئەو ئاسنە خڕەیە، کە لەژێر بەرداشی دادەنرێ.

**گوڵەمێخەک**: گوڵێکی هەمەڕەنگە و بۆنخۆشە. ـــ ی کێوی: هولێمە.

**گوڵەمێلاقە**: گولاڵە سوورە، گوڵەنیسان، گانگلۆک.

**گوڵەنگ** (کە.): گوڵینگ.

**گوڵەنیسان** (کە.): گوڵەمێلاقە.

**گوڵەواز**: گوڵێکی بەهارییە، دوو بست بڵند دەبێ و لەنێو گوڵەکەیدا چتێکی وەکو تەماتە دەردەکات، گەڵای وەنی لالەعەباسی دەچێ و گوڵی وەکو گوڵی بیبەری سوورە و لەنێو باخاندا پێ دەگات.

**گوڵەوەچنی** (بابا.): گوڵ هەڵگرەوە، گوڵچن.

**گوڵباتمان**: جوورە پارچەیەکە، کاڵا.

**گوڵبانگ**: جووان بانگکردن.

**گوڵ بەدەم**: نێوی ئافرەتانە. ئاروو، هەناری ساوا.

**گوڵ بەدەن**: لەش ناسک و نێوی ئافرەتانە.

**گوڵ بەژن**: باڵا باریک و ناسک، نێوی ئافرەتانە.

**گوڵبەهار**: نێوی ئافرەتانە.

**گوڵ بزن** (کە.): شلێر.

**گوڵبێنە** (کە.): گلۆێنە.

**گوڵ بێنک**: ملوانە و گەڵادەی ملی گوێلکانە.

**گوڵپ** (باک.): قوم، قومێک. (باک.) ـــ ک: قومێکی چکۆلە.

**گوڵ پەمۆ**: ڕەنگی سوورێکی کاڵە، کە بە دۆ و ڕۆنیاسی دروست دەکرێ.

**گوڵ پەرشە** (موک.): جوورە گەنمێکە.

**گوڵ پرتەقاڵی**: گوڵێکی کەم بۆن و زەردە بەشەو دەپشکوێ.

**گوڵ خونچە**: گوڵێکی نەپشکووتووە.

**گوڵتە** (کە.، ڕۆژ.، باک.): جوورە کوڵەکەیەکی جارەکییە وەبەر جێگەی بەترس دەدرێت، جا سەربان یان دیواری شکست. تیرەگ. بێ ـــ: بێ پاڵەوانە، بێ تیرەگ.

**گوڵخەزێم**: حاجیلە، جوورە گیایەکە.

**گوڵچن**: گوڵەوەچن. ـــ کردن: هەڵبژاردن.

**گوڵچین**: نێوی ئافرەتانە.

**گوڵچیچک**: گوڵەقەلەفسە.

**گوڵخواردن**: فریوخواردن، فریوان.

**گوڵخەن** (کە.): پێکەنینێکی شیرینە.

**گوڵدان**: (باک.) گوڵدانک، هنجان. دەفرێکە گوڵی تێدەکەن.

**گوڵڕەنگ**: ڕەنگی گوڵی، گوڵڕەنگ. نێوی ئافرەتانە.

**گوڵدەخوین** (باد.): گوڵێکی سوورە.

**گوڵی شووشان** (باد.): گوڵێکە.

**گوڵروو**: ڕووگوڵ، نێوی ئافرەتانە.

**گولکفان** (باد.): گوێلکەوان.

**گوڵرووت** (موک.): جوورە گەنمێکە گوڵەکەی قەڵچخی نییە.

**گوڵزار**: گوڵستان، لالەزار، باخچەی گوڵان. نێوی ئافرەتانە.

**گوڵسۆ** (فە.): گوڵستان.

**گوڵسۆس** (باک.): سوێسنە.

**گوڵشا**: نێوی ئافرەتانە.

**گوڵشەن**: باخچەی گوڵان.

**گوڵشیلان**: شیلان.

**گولفک**: گرێ بەقوڵفە.

**گوڵ ستێرە**: گوڵێکی سپییە.

**گوڵکە**: خۆشەویست.

**گوڵکیژۆڵە**: گوڵێکی بێ بۆن و شین و سپییە.

**گوڵگوڵی** (کە.): گوڵڕەنگ. چەشنی گوڵی، ڕەنگاوڕەنگ.

**گوڵمە**: گۆشتی بێ ئێسک.

**گوڵمی ئاف** (باک.): گیایەکە.

**گوڵمیخ**: پێگۆزەک، سنگک. سینگی ئاسنە، بزمارێکی گەورەیە لە دار یا لە ئاسنی دەدەن.

**گوڵنار** (کە.): گوڵەهەنار.

**گوڵناز**: نێوی ئافرەتانە. نازی گوڵ.

**گوڵنەخوین** (باک.): گوڵێکی سوورە و زۆر بۆنی خۆشە. گوڵێکی چیاییە، چەند لقێکە لە نێوانیاندا و چەند نێرتکێک دەردەچێ و گوڵی هەموویان سەرشۆڕ دەکەن، ڕەنگی سوور و ئاڵ و پرتەقاڵییە و بۆنیشیان ناخۆشە.

**گوڵند** (باد.): گزگل، گەڵوان.

**گوڵندام**: گوڵ ئەندام. ناوی ئافرەتانە.

**گوڵنگ**: لە خوری، دەزوو یا ئاوریشم دروستدەکرێ و بەکەناری زین و جاجم و لانک و ... وەکو ڕیش شۆڕدەبێتەوە، گولینگ. ـــ ە: قۆتاس، قۆیتاس.

**گوڵنیشان**: گوڵێکی سوور و بێ بۆنە.

**گوڵواژە**: قسەی خۆش، پەند.

**گوڵوان** (کۆ.): گەڵوان، گزگل.

**گۆلیینە** (خۆ.): تەشوێیەکی گچکەیە، ناوی کەوچکی داری پێ دەکۆڵرێ.

**گوڵ نیلۆفەر**: گوڵێکی مەخمەری و سوور و بڵند و بێ بۆنە.

**گوڵۆکە**: گەپلە. گیایەکە ڕووت و لووس هەڵدەچێ و کوێستان گوڵی زەرد دەردەکات، لەسەری هەموو لکەکان گەڵاکانی ٤ ـ ٣ دانەن.

**گوڵۆک** (باک.): گلۆڵەی دەزوو یا بەن.

**گوڵۆلک** (باک.): غەرغەرە یا هەر چتێکی وەکو مەندیلە چتی تێ هەڵێنرێ.

**گوڵوو** (باک.): تۆپ، گوللە.

**گوڵووک**: گوڵ.

**گوڵۆڵە**: گلۆڵە، ئیفلیج، نەبزوێو.

**گوڵۆنگ**: گوڵینک.

**گوڵهۆقە** (کە.): جوورە کالاّیەکی سوورمەدارە.

**گولی** (باک.): شەخەڵ، قوڵفە، ئالقە، گولک. (باک.) ــ فک: خشلی ژنانە، گوڵێکی زۆر جوانە. ــ ڤک: گوڵینگەی شەدە و پێچی سەر.

**گوڵی نەسیەک**: گیایەکە لەنێو ئاویدا دەیەدەن بە ڕەشەگرانەتادار زۆر بەسوودە.

**گوڵینگ**: گفکە، گوڵۆنگ، گیفک، گوفک.

**گولیلک** (کە.): گوڵ.

**گوڵنگ**: میتکە، گولنک.

**گوم**: بزر، ون، شاراوە، پەنهان، وون بوون. شاررانەوە. ــ بوون: شاررانەوە، بزربوون، ــ کردن.: بزرکردن، شاردنەوە. ــ بوو: وون بوو.

**گومان**: شک، دوودڵی، دلاّودڵی، سوو. ــ کردن: سووکردن. بە ــ: سوودار، بێ ــ: بێ دوودڵی.

**گومەت** (کە.): گومبەز، گومەز. ــ ە: بازدان، قەڵەمباز.

**گومەتە**: بازدان، هەڵپەرینە هەوا. (جا.) ــ دان: بەتین و زەبرەوە بۆ بازدان خۆئامادەکردن.

**گومەز**: گومبەز، گومبەد.

**گومڕا**: ڕێ لێ وون بوو. ــ یی: ڕێ لێ وونبوویی.

**گومڕگ**: باژ لەسەر کەل و پەل وەرگرتن.

**گومگومۆک**: فات فاتک، خەمەگرێ، قمقمۆکەی ئاوێ، گومگومک.

**گومی**: بزری، وونی.

**گومین** (باک.): خلۆربوونەوە.

**گون**: ڕەتل، ڕتل، هێلک، باتو.

**گوناح**: سووچ، تاوان، گوناه.

**گوناه**: بڕوانە: گوناح. ــ بار: سووچدار، تاوانبار، گونابار. ــ کار: ڕووسارد.

**گونەپشیلە**: گیایەکە گەڵای زۆر وورده و لە گەڵێک جێگایاندا گوڵی سپی دەردەکات.

**گونج**: گۆنکە، لوولەی گڵی سوورەوەکراوە لە جۆگەی بن زەوی دەگری بۆ ئاو پێدا بردن. (هەورا.) ــ ەنە: دۆخین، تکە.

**گونجان**: لوان، سازان، شیان، کۆک بوون.

**گونجاندن**: لواندن، سازاندن، شیاندن.

**گونجیلکە** (کۆ.): گورچیلە.

**گونجە** (باد.): جەزا، پاداشی، تۆڵە.

**گوند** (هەو.): دێ، لادێ، دەگا. ــ ار: دەماردار، زەبەردەست، بە هێز، بەگون، گونک. ــ ی: لادێیی. (بابا.) ئەنگوتک. ــ یاری: دێهاتی.

**گوندە**: چتی خڕ، قەڵەو، گلمەت، گلۆ، گلوو، گرمۆڵە، گرمووڵە. قۆڕ.

**گوندریا** (فە.): قۆڕ، گونک.

**گوندک** (بابا.): ئەنگوتک.

**گوندور** (باد.) کالەک، گندۆرە، گوندۆرە.

**گوندۆرە** (هەو.): بڕوانە: گوندور.

**گوندوش** (شەبە.، دەر.): سووژن، شووژن.

**گونڕەش**: یاخی، زۆردار، سەرکێش.

**گونک**: مرۆی قۆڕ.

**گونکە** (بابا.): ئەنگوتک، جوورە ترێیەکە.

**گونکێ** (هەورا.): ئەنگوتک.

**گونۆژ** (ڕۆژ.): سووژن.

**گونووشی**: سوژن.

**گوە** (باک.): گوێ، گوێچکە. پەلکا ــ: نەرمایەکەی گوێ. چەرمکی ــ: سەرەوەی گوێ. کرکرکا ــ: کرکرۆچکەی گوێ، کریژۆکا ــ: کونی گوێچکە. (باک.) ــ ار: گوارە، گۆڕین.

**گوهارتن** (باک.): گۆڕین، گوێزتنەوە.

**گوهارتۆ** (باک.): گۆڕین.

**گوهارزەری** (باک.): ماکینەی شەرپیە دیواری پێ تێکدەدرێ.

**گوهازتن**: گوێزتنەوەی ماڵ یا بووک. گوێزان.

**گوهازتۆ** (باک.): کۆپیە، ڕوونووس.

**گوهداری** (باد.): گوێدێری.

**گوهان** (باک.): گووانی وولاّخ، چەختی.

**گوهتەزی** (باک.): دونیا دیتوو، دونیا دیدە.

**گوهەر**: گەوهەر.

**گوهەسترە**: گورنەستێرە.

**گووهەستیرک** (باک.): گورنەستێرە. مێشێکە بەشەو دەفڕێ و قوونی دەدرەوشێتەوە.

**گووهەسن** (باک.): گوناسن، زووخالی سنگ.

**گوهبەل**: گوێبەل.

**گوهشەک** (باک.): جوورە گەمەیەکە.

**گوهدار**: گوێدێر. ــ ی: گوێدێری.

**گوهدان**: گوێدان.

**گووهرستارە** (کە.): کرمێکی باڵدارە بەشەو بە هەوادا دەگەڕێ و دەتروسکێ.

**گوهرین** (باک.): گۆڕین.

**گوهکتک** (باد.، باک.): گیایەکە.

**گوهماسی** (باک.): پوولەکەی ماسی.

**گوهیرانن** (باک.): گۆڕین.

**گووهیز** (باک.): گێوژ.

**گوهیشک** (باک.): قولاپە. دەماری ئەستورەکانی قولاپی سەرەوەی پانییە لەپشتەوە.

**گوهن** (باک.): مادەیەکە چەند چتێکی تێدایە لەنێو لەشی ژناندا (جێی شەرم) پەیدا دەبێ.

**گوهنەفیل** (باک.): گوهنێل.

**گوهنێل** (باک.): فاڵ، گوهنێر.

**گوهۆر** (باک.): دۆڵ، شیو.

**گوهڕاندن** (باک.): گوهێراندن، گۆڕین.

**گوێ**: گوێچکە، گـوه. گوَ. ـــ لـە مست: خۆشباوەڕ. خستنە پشت ـــ: گـوێ پێنـەدان. بـە ـــ هـەڵێنان: بە گوێدا خوێندن. ـــ بان: سـەرەتاتکە، سەراسوێ. ـــ بەگوارە: گیلاخە، گیایەکە. قـەراخ، کـەنار. ـــ گران: گـوێ کـپ. ـــ بڕ: دەستبڕ. ـــ بەرخە: گوێ بەرخۆڵـە، گیایەکـە دەخورێ. ـــ بیست: گوێدێر، گوێدار. ـــ بەل: گوهبەل، گـەوج، راز ڕانـەگر. ـــ درێژ: کەر. ـــ دێری: فەرمان بەرداری، سەرشۆڕی. ـــ ڕاگر: بیستەر.

**گوێرمە**: کەمکەمـە بـە دەسـتی مـەمکی وولاخ و ئـاژاڵی شـیردار بـە بێچوەکان بە مژێندانە تا شیری دابدات.

**گوێروو**: گووارە.

**گوێـز**: جـوز، (هـەورا.) وەزی. فەریکـە ـــ: کـاردەوەژە. ـــ ی کوێـر: گوێزێکە بە کاکل نەبێ. گیز، گۆز، (فە.) گردەکان، گووز، وەزی.

**گوێزان**: گیزانی تراش، جۆزان، جووزان، دووزان، گووزان.

**گوێزانەوە**: گواستنەوە، گوێزانەوە.

**گوێزاندنەوە**: گۆستنەوە، گوێزتنەوە.

**گوێزتنـەوە**: ڕاوارتـن، گۆزاندنـەوە، گواسـتنەوە، ڕاگۆستن، ئاڵوگۆڕ، ئازووگوێز، گوهاستن، هلکواشتن، کەل و پەل یا نێـو ماڵ یا بووک لە جێگایەکەوە بردنە جێگایەکی دی.

**گووێزرانەوە**: گۆزانەوە، گوێزانەوە.

**گوێزرینگانەوە**: دەنگە دەنگ لەنێو گوێ هاتن.

**گوێزنـگ** (مـوک.): چـوو، چـووە، قـاپ، (بـاد.) گـۆزەک، گـووزەک، گۆزینک، پانی.

**گوێزێن**: گەمەیەکە بە گوێزان دەکرێت.

**گوێزینگ**: بڕوانە: گوێزنگ.

**گوێسەبانە** (جا.): گوێسوانە، سوانده، سڤانده، پاسارە، کـەناری بانێیـە کەمێک لەسەر دیوار تێدەپەرێت.

**گوێ سوانە**: بڕوانە: گوێسەبانە.

**گوێ سووک**: بە کەسێک دەکوترێت، کە زوو گوێی لـە دەنگی بەرامبەر بێت.

**گوێ شلکردن**: گوێ بۆ قسە ڕاگرتن، گوێ گرتن.

**گوێ شۆڕ**: گوورد، بۆ بزن بەکاردەبرێت.

**گوێ کەفتە**: تەختەساف. کەسێک کە تۆزێک لە گوێی پەڕیبێت.

**گوێگر**: بیسەر. ـــ ان: بیسەران.

**گوێگران**: کەسێکە، کە درەنگ دەبیسێت، کەڕ.

**گوێگرتن**: گوهگرن، گوگرن، بیستن، گوێدان بە قسە.

**گوێلاک**: پۆتراک، سەر و پۆتراک.

**گوێلک**: گۆلک، گوێر، گوێرەکە، گۆر، گۆرە.

**گوێلکەدان**: گۆلکڤان، گۆرەلەوان، گۆرەوان.

**گوێ مووچ** (دزە.): جووتەگوێ قیت و ڕوو بـە بڵنـد نـەبێ. بـەڵکو ڕاست ڕوو بە پێشەوە ڕاکشابێ.

**گوێلکەساوا**: گوێلکێکە تازە بووبێ، کە نێربێ لە ساڵی دووەمدا بـارگوێرە لە هەولێرێ بەرگێری پێدەڵێن، لە ساڵی سێیەمدا دەبێتـە بـەرەجووت لـە ساڵی چوارەمدا گاجووتە، کە مێ بێت لە ساڵی دووەمدا بەرکەڵە لەساڵی سێیەمدا نێنگۆنە لە ساڵی چوارەمدا مانگایە.

**گوێن** (کە.): چەرم، پێست. ـــ ی: گینی، هۆڵاڵی، (بـاد.) گوێنگلک. گەوەن، (هەورا.) هەنگەوەن.

**گوویشک**: گێوژ، گەیشک، (باک.) گەهووژ.

**گوێی** (باک.): دەڵمەی شیری.

**گوییک**: گوێنگلک، گووێنی.

**گووێن**: فەلـەک زەدە، بەدبەخت، گێچەڵ هەلاّیسێن. باڵندەیەکە بەشەو دەخوێنێت.

**گها** (باک.): گەیشتن (بۆ میوە). ـــ یی: گەیشتن.

**گهارەنگ** (باک.): جوورە گیایەکە.

**گهاشتن** (باک.): گەیشتن (بۆ میوە).

**گهـان** (بـاک.): گەیشـتن. ـــ هـەڤ: پێککەیشـتن. (بـاک.) ـــ دن: گەیاندن. ـــ هەڤ: گەیاندنە یەکتری. خوە ـــ: وێکهێنان.

**گهیشک** (باک.، ئام.): بڕوانە: گوویشک.

**گهووژ** (باک.): بڕوانە: گوویشک.

**گـێ** (هـەو.، ڕەوا.، شـوا.): گـوێ. کانگـەر، کـە تـەنیا بـۆ جنێـودان بەکاردەبرێت: دایکی خۆگێ، ئەو کەسەیە بگێ.

**گیا**: گـەیا، (هەورا.) گییـوا، شینایی. ـــ ی ووشـک: پـووش، بـوار. (گەر.) دایک، دێ لە وەڵام دەڵێن (ئەڤ گیا منە).

**گیـا ئالـەت**: گیایەکـە بـە کوتـراوی لـەسـەر هـەر جێگایـەکی دانـرێ قووتوویەکی بەسەر ڕوو دابگیرێت، تـا هـەوا نـەدات دەست بـەجێ دەرکی دەکات، بۆ کوولکان باشە.

**گیا ئەسپۆن**: بڕوانە: ئەسپۆن.

**گیا بەرخۆڵە**: پاڵمە، چەورک، چەورژکە، چەورە.

**گیابەن**: گیایەکە بەنی لێ دروست دەکرێت.

**گیابەند**: گیایەکـە لـە شـاخاندا دەڕوێـت، گوڵـی سـپی و بـۆن خۆشـە و ئاوەکـەی بـۆ ژانـە زگ زۆر باشـە. (هـەورا.) وەرکەمـەر، ڤەرکەمـەر، (هەکا.) خوشبین.

**گیـا بـڕ** (مـوک.): (بابـا.) فیرکـە. زگچوونـی مالاّتانـە. نەخۆشـیەکە بـەهۆی کرمێکـەوە پـەیدادەبێت و لـەنێو ئـاو و گیایـاندا دەژی و مـالاّت بیخوا پێی دەفیرێنێ. پیـک بـڕە. (مـەنگوڕ) گیایەکـە حـەیوان بیخـوا دەمرێ. (پژ.) ڕێنج. (هەورا.) مافەتە.

**گیا بڕە** (موک.، بل.، ئاک.): گیایەکە قەفقەفیە، قەفەکەی سوورە و لە چیایان دەیدروونەوە بۆ مالاّتان. گیابڕکە، فیرکە؟

**گیابڕکە**: بڕوانە: گیا بڕە.

**گیابڕین**: گیا دەرمانە. گیایەکە بستێک بڵند دەبێت و گوڵەکەی وەکو نی بووژانی سوورە.

**گیابڕینە:** بەتۆزی بۆ برینی زۆرباشە. بەتەڕی بکوترێ لەسەر هەر جێگایەکی لەشی مرۆڤی دانرێ دەیکاتە برین لەنێو کەژمێراندا دەیکاتە پوقلە (پورگ).

**گیا بۆگەنە:** گیای بۆگەنیوە، کە کوڵاناوەکەی لە جێگای خارشتدار برژێ یا تڵتەکەی لەسەر دانرێ زۆر باشە.

**گیا پاڵوانە** (کە.): گیایەکی بەهارییە.

**گیا پیرێژنە:** چڵە گیایەکە گوڵێکی بۆری هەیە، بە ووشکی تف لەسەر گوڵەکەی دانرێ ئاوەڵەی دەکاتەوە.

**گیاجاڕ:** مێرگ.

**گیاچا:** گیا کووڵکنە.

**گیا چنارە:** گیایەکە بە کوڵاوی دەکرێتە چرک، بۆ برینان زۆر باشە. تەنها بۆ برینی ماڵاتان بەکاردەبرێ.

**گیا دەرمانە:** گیا برین.

**گیا دووپشکە:** دوو جوورە: ١) گەڵای درێژاوی و زۆر ئەستوورە. ٢) چڵە گیایەکە وە چڵە گەنمی دەچێ، بەڵام گەڵای لەوی باریکترە و کورتترە. لەسەرەوە گوڵی وەکو گەنمی دەردەکات، بەڵان گوڵەکە بەقەد گرێیەکی قامکی درێژە و بەتەڕی نەرمە و بەووشکی دەبێتە دڕوو.

**گیا زاخە** (شوا.): کەرخنکێنە.

**گیا زڵفا:** خاڵە ڕەشە. گیایەکە لە ئەشکەوتەکان لەژێر سێبەراندا شین دەبێت.

**گیا زەرتک:** گیایەکە بستێک بڵند و گوڵی زەردە، گوڵەکەی ووشک بێت، کە بە برینان وەرکرێ دەیبرژێنێتەوە.

**گیا زەڵمە** (جا.): گیایەکە باقەی پێ دەبەستن. گیایەکی سپی سووە.

**گیا ساڵمە** (بانە.): گیا سنجابی. گەڵای پانە، گوڵی سوورە و بنەکەی وەکو پەنجەیە.

**گیا سنجابی:** گیا ساڵمە.

**گیا سەفرا:** چڵە گیایەکە بستێک بڵند دەبێت. گوڵی زەرد و وورده وە بۆنخۆشکەی دەچێ و لەو چڵە سێ لکی لێ دەبێتەوە. لەگەڵ شیرینی و دۆشاو دەخورێ و زگ زۆرباش دەچوێنێت.

**گیا کەندر:** کندر، کەندر.

**گیا کیش** (باک.): ڕەکێشە.

**گیا کووڵکنە:** گیاچا. بۆ زگ ئێشە باشە.

**گیا گەزک** (باک.): گەزگەزک.

**گیا گێزەر:** پنجە گیایەکە وەجوێ دەچێ و لە جێگای غەدار و بن بەردان شین دەبێت.

**گیا مسک:** گیایەکی بۆن خۆشە.

**گیان:** روح، بەدەن، ڕەوان. ــــ دار: گیان لەبەر. ــــ وەبەرهێنان: زیندووکردنەوە. بەــــت خۆش: نۆش. ــــ سپاردن: مردن. ــــ کێشان: گیان دان. ــــ لەبەر: زیندوو. برادەری ــــ ی: برادەری ڕاستەقینە.

**گیا ناوکە** (موک.): پنجە گیایەکە بە زەویدا پان دەبێتەوە.

**گیا نەرمۆکە:** گیایەکە لکەکانی هەروەکو کلکە ڕێوی دەچێ، ئەژنۆیەک پتر بڵند دەبێ، گوڵی تۆپە و سپییە.

**گیانەلا:** سەرەمەرگ.

**گیانەلاو:** گیانەلا.

**گیانی گیانان:** ڕەوانی ڕەوانان. نێوی خودایە.

**گیا نێری** (بال.): جوورە گیایەکە.

**گیا وەردێنە** (بابا.): گیایەکی گەڵا وووردە، بۆ زگ ئێشە باشە.

**گیا و گۆتەڵ** (کە.): گیارگۆڵ، گژرگیا.

**گیا و گۆڵ:** گیارگۆتەڵ.

**گیا هەنگووستیلە:** جوورە گیایەکە.

**گیای خۆڕوو:** گیای خۆڕسک.

**گیدار** (سوور.، ڕەوا.): دێ، دێچروو، گیشەی چروانە بۆ زستانێ بۆ وڵاخان بەکاردەبرێ.

**گیپاری** (زاخ.): گیپە.

**گیپاڵ** (کە.) گەدک، ڕیخۆڵە، گەدرگیپاڵ. (فە.) گیپە.

**گیپە:** گیپاری. وورگی پارچەپارچەکراوی درێژاوی پڕ لە برنج، کشمیش، بادام و بەهاراتە و لەنێو چێشتی سەروپێ کرابێت.

**گێپەرە** (کە.): خینگە، ئەستوورایی ئەستۆ، گنێخە، تەنگە ئەستوور.

**گێج** (هەورا.): گێژەن، گێژاو، گێژ، هوڕ. (هەورا.) ــــ ەنە: گرێژەنە، ڕێشمە.

**گێچ:** گەچ. ــــ کاری: گەچکاری. ــــ نووس: تەباشیر.

**گێچەڵ:** پرووشە، کڵۆڵی، پەتەر، تەگەرە، تەشقەڵە. تووشی ــــ هاتن: تووشی پرووشە هاتن.

**گێر** (خۆ.): جغز، جەغز. خەتێکە لەسەر کاغەز یا ئەردی بە خەری بێ. چتێکە لە گەروو نەچێتە خوارەوە. گرفتهێنەر. گیرۆدە، پەککەوتن. گوێزێکە بەتەڕی هەڵگیرێ و نێوی خراپ بێ و تامی ناخۆش بێ. گوێز یا ڕزێکە تیژ بێت.

**گیرا** (کە.): ڕژد، سەختگیر. سەگی دڕ. وەخۆگرتن.

**گیراو** (گەر.): هەموو چێشتێکە تەنیا پلاو و قبوڵی نەبێ.

**گیرامەبۆ** (ژا.): قبووڵ دەبێ.

**گیران:** گرتن، گرتنی ڕوناکی هەتاو بە هۆی مانگەوە و گرتنی ڕووناکی مانگ بە هۆی خۆرەوە. بەندبوون لە گرتووخانەدا.

**گیراو:** بەندی، گریاک.

**گیرسان:** هەڵبوون. ــــ دنەوە: خۆپێوەگیرسان. ــــ دن: هەڵکردن.

**گیرفان:** بەرک، بەریک، بەری، کوورک، ڤەریک، گیفان.

**گیرگە:** ددانی شەڕێ.

**گیرمی:** خۆراک.

**گیرە** (خۆ.): ددانەکانی ژێر چاوی وولاخ و ماڵات و جانەوەران. ئامرازێکە شتی پێ دەگیرێت.

**گیزە:** دەنگی کوڵانی مەنجەڵ و سەماوەرو... ــــ گیز: گزەگز.

**گیز** (باک.): نالەبار، ناهەموار.

**گێر** (باک.): قاپ، گێژەڵووکە. ــــ بوون: خلۆربوونەوە.

**گێڕ**: خووار و خێچ. (ڕەوا.) دێڕ. ئیفلیج. (بار.) ڕێگایەکی ڕاستە بە بەرقەدی چیایانەوە، پێچی ناو چیایانە.

**گێڕان**: گەڕاندن. کردن. لەسەر ـــ: دەبەرمراندن، قوربان کردن.

**گێڕانەوە**: گەڕاندنەوە، ڤەگەراندن. گێڕاندنەوە. زەوتکردن. گلدانەوە.

**گێڕە**: شێلان بە هۆی وولاخ. (باک.) ـــ ڤێرە: تێکەڵ و پێکەڵ.

**گێڕەپانە** (ڕەوا.، خۆ.): گوێ ڕەپە.

**گێڕەشێوێن**: ئاژاوەچی.

**گێڕەوە**: گێڕەڕەوە، ڕادیۆ.

گێڕەوە

**گێڕەرەوە**: گێڕەوە.

**گێڕەوکێشە**: دان و سەندن، هێنان و بردن.

**گێس** (دەر.): پرچ.

**گێسکە مێ**: کارە مێ.

**گێسکە نێر**: کارەنێر.

**گێسک**: بە کاریلەیەکی نێر یا مێ دەکوترێ، لەپاش ٥ ـ ٦ مانگی بوونیەوە ـــ پێ دەکوترێ.

**گێسکەزا** (کە.): ئەو کاریلەیە، کە لە کاری پەیدا دەبێ.

**گێسن** (باک.): گاسن.

**گێشە** (دزە.): ئەو گیا و دەغل و دانەیە، کە لەکاتی دروێنە بە باوەش کۆ دەکرێتەوە.

**گێشەی دار**: قۆڵندەر، کۆڵندەر.

**گێشەکار**: گیشەکەر، (ڕۆژ.) تایەنێر. ئەو کەسەیە بە باوەش گیا یا گەنم و جۆی دروراو لە شوێنێکی کۆدەکاتەوە و لەسەر یەکتری دەی پەستێوێ.

**گێفک** (بابا.، بالەک): گوولێنک.

**گێفۆک** (بار.): سەروگوویلک.

**گێڤ**: قیت، بە هەوا. لە خۆبایی. هەڕەشە. ـــ او: گیا. ـــە: دەنگەدەنگ، گڤەگڤ.

**گێکۆزی** (باک.): کوشتار. نەبوو و ڕیشەی هەڵکەندن.

**گێل** (هەکا.، باک.): قوڕ.

**گێنگڵ**: جینگل، خووار. ـــ دان: جینگڵ خوواردن.

**گێنگوڵ** (ڕەوا.): بڕوانە: گینگڵ.

**گێنوو** (بابا.): گوورێنی.

**گێون** (هەورا.): گیان.

**گێو**: نێوی پیاوانە، نێوی دانەر و خاوەنی ئەو فەرهەنگەیە.

**گێوا** (هەورا.): گیا. ڕووەک. شینایی.

**گێوە**: مۆرانە. چەشنە کرمێکە دار، بەن، کەل و پەل دەخوا.

**گێهان**: گێتی، جیهان، دونیا.

**گێرکە**: وورردە مێروولە.

**گێرمێ**: خوان، مێزی خواردەمەنی.

**گێرندە**: خولێن، سوڕەر.

**گێرنگ** (باک.): مێروولەی وورد.

**گێرۆفەن** (باک.): توانایی، ئامادەیی، زرنگی.

**گێرۆزە** (باک.): دەستاڕ.

**گێڕی**: خوواری، خێچی، لاری.

**گێڕیی** (باک.): خڵتەی ڕۆنە و ئی دی.

**گێزەر**: گەزەر، کارووت، کارۆت.

**گێزبەلۆک** (باک.): گوێزبەلە، گیایی، گێزبەلە.

**گێزبەڵە**: گێزبەلۆک.

**گێزکردن**: ئاوڕدانەوە.

**گێزیک**: قالۆچەی باڵدار.

**گێژ**: وورِ، سەرگێژ، کاس. دۆش، هێڕ، هوڕ، حەپۆڵ، حۆل. ـــ بوون: کاسان. ـــ کردن: تەرتلاندن. هوڕکردن.

**گێژاو**: گێژینە، گرداو، گەرداو، گرداف، گێژەن. گێژ، گێژەنگە. نەگبەتی، ڕووشە، نشووڤ.

**گێژە**: بێژان، لە بێژنک. ـــ کردن: لە بێژنک دان. ـــ گێژە: بەدەوری خۆدا سووڕان. ـــ لۆک: گووژاڵک. ـــ لووکە: گەردەلوول، گەر، گەرداف، گەرەپیچە. گێڕ. ـــ و کردن: لە بێژنک دان.

**گێژەن** (هەورا.): تەلەزگە، کێچەڵ، گێژاوی ئاوی. ئەو جێگایانەیە لە چۆمدا، کە ئاوی تێدا خولی دەخواتەوە.

**گێژەنگ**: تەندوورە زەنە. ـــە: گێژاو.

**گێژکە** (باک.): مێروولە سوورکە. (خۆ.) گێژەوکردنی دەغڵی.

**گێژگوول** (باک.): خۆشەویست، دۆست، دڵدار.

**گێژی**: سەر بەردایی، سەرگێراهی، هووڕی، هێڕی. ـــ ینە: تەندوورە ژەنە.

**گێژ و وڕ**: گێژ، بەنگی، خوولیا. ـــ ی: خولیایی، ماخولیایی.

**گێژوویژ**: ماخولیا، هێڕ، بەنگی.

**گێس** (شوا.، فە.): زولفی ئافرەتانە، پرچ، بسک.

**گێسک** (هەو.): گەسک.

**گێسن** (زا.): گاوەسن، گاسن.

**گێل**: هێڕ، گەمژەل، خرەو، زلحۆل، گەلحۆ، لازک، حەپۆل، تۆلاز، حولحولی، گەلۆر، گەرج، بێ مێشک. پاتال، بالە.

**گێڵ**: کەژ، گەشت، گەڕان.

**گێلاخە**: (گەرمێن و هەولێر) سێ بسکە، سێ بسکۆلە. گوێ بە گوارە.

**گێلاس**: نێوی ئافرەتانە، گلیاز، ئاڤژەلەک.

**گێلان** (ژا.): گەڕان، گەڕیان، سووڕان.

**گێلانەوە**: گەڕانەوە، گێڕانەوە.

**گێلای** (هەورا.): کۆڵینەوە. گەڕان، سووڕخوواردن. گەڕانەوە.

**گێلە**: گەلە، مێگەل، ڕان. (هەورا.) ـــ مەوە: بگەڕێوە.

**گێلگێلە**: تەختە بافتە یا چتێکی دی هێندەی بەری دەستێ و سێ گۆشە پێنج لزگەی شیلانی سووری تێ دەخەن و سەری هەریەکەشی ئەشرەفیکی بە قوولاپ پێوە دەبەستن و بە لایەکی سەریدا هەڵدەواسرێ.

**گێلنای** (هەورا.): گەڕاندنەوە.

**گێلنیۆ** (هەورا.): ناردنەوە.

**گێڵنە شۆ** (هەورا.): بیکێڕەوە.

**گێڵۆ** (شار.): جوورە هەرزنێکە.

**گێلی:** حۆلی، هوڕی، تۆلازی.

**گینگڵ:** جینگڵ، ئۆقرەنەگرتن لەبەر ئازار و دەرد.

**گێنگڵ** (سلە.): چیکڵدانی پێچ و دووکەڵ و باومار.

**گێنگڵە** (کە.): سووڕدان و خولانی بێ کار.

**گێنۆ** (سەق.): سەندەڵ.

**گێو** (هەورا.): شوێن.

**گێوژ:** گەهوژ، گەهیشک، گۆشک، گوویشک، گوهێژ، گۆێژ، گڤیر، رێلی.

**گیاڕەش** (باد.): گیایەکە ناخورێ.

**گیاکزیک** (باد.): جوورە گیایەکە.

**گیانەوەر:** گیاندار.

# ل

ل: تیپێکی ئابێی کوردییە. لە موکریاندا لەگەلێک جێگایاندا بە (ڵ) و لە سۆراندا بە (ر) بەکاردەبرێ وەکو مار، خار: ماڵ، خاڵ و لە باکووردا بە (ل) بەکاردەبرێ.

**لا:** کن، کەنار، ڕۆخ، (باد.) ڕەخ، لال. بە ــ داکەوتن: کەوتن، مردن، بە ــ داهاتن: وەلاداهاتن، پێڕاهینان. بەر، بال، با، (باک.)هدام، لبامن: لەکن من، لال، جەم، چیبق، گڤک، کن، نک، هند، تەنیشت، کنار، دیار، لاتەنیشت، قەد، تی، ڕووە، تەک، لە ــ ی منە، لە ــ ی تۆیە. بۆ ــ ی من هات: بەر ب من ڤاهات.

ئەو شۆخە هەتاوا لە منی غەمزە دە لابێ شووربم لە دەما ژەهرە ئەگەر.

... لا (فە.) بسک. لە ــ: مەز، چەنی. ئاوڕ، یارمەتی. ــ لێ کردنەوە: ئاوڕ لێ دانەوە، یارمەتی دان. وە ــ بردن: لابردن. ــ ی دوواوە: پەلی دوواوە. یەک ــ کردنەوە، بە ــ دا خووار بوونەوە، بە ــ داهاتن: ڕەت بردن، پێ ڕاهاتن، بەسەر لاتەنیشتێدا لەتر بردن، مردن. قازانج: لای تۆیە، لای منە: باوی تۆیە، باوی منە. ــ گیر: تەرەفدار، ــ ی تۆیە.

**لابار** (لاباڵ): لنگەبار، تا، بەستەک، باڵە ــ عربی، تەنها لایەکی باڵی. باڵێکی باڵدار. کەنارەی باڵ، یەک باڵ.

**لاباز** (ڕۆژ.): بزنێکە لاتەنیشتێکی بەڵەک بێ. نێوێکی تایبەتییە بۆ ڕەگەزێکی ولاخی بەرزە.

**لابانە:** جووتێر کە هات جووتی بکا زەوییەکەی دەکاتە چەند بەشێکی گەورە کە پێی دەڵێن (بانە). ئەوی مایەوە و ئەندازەکەی ناتەواو بوو لابانەی پێ دەڵێن کە ئەویش بەش دەکرێ و دەکرێتە چەند لاتێک.

**لابە:** وەلابە، ببە جێگایەکی دی. لابردن.

**لابەر:** لادەر.

**لابەرە** (ڕۆژ.): جامی مەردۆشی، قاپێکە مالاتی تێدا بدۆشرێ.

**لابەلا:** خوارو خێچ، نەگونجاو. ــ یی: خواروخێچی، نەگونجاوی.

**لابڕ** (دەر.): بڤر (ئی ڕاوەماسی).

**لابڕاو:** دوورخراو، دەرکراو، وەلانراو.*

**لابردن:** پەردان، رڤان، وەلابردن، ڕاکرن، هلبرن، شەلباندن.

**لابک** (باک.): تەڵەی ئاسن.

**لابلابک** (باک.): لاولاو.

**لاپووتە** (باک.): مەساسەی جووتی.

**لابیان:** گەنجینە، خەڵوەتی، ئەو پارچە سەرمایە کە هەیبێ.

**لاپاڵ:** بەرقەدی شاخی، قەدی چیاوکێوان.

**لاپاو:** بڕوانە (لافاو).

**لاپەڕ:** لاپەڕگە، پەناگە.

**لاپەڕە:** ڕووپەڕە، ڕووپەل.

**لاپەڕگە:** لاپەڕ، لاپەڕە.

**لاپرەسەن:** لابڕە. خۆتێهەڵقوتێن.

**لاپرەسەنی:** مووشەک، کەسێکە بێ بانگ هێشتن کردن بچێتە سەر سفرەی خەڵکی، تەرەفە.

**لاپلا** (هەورا.): بڕوانە (لابەلا).

**لاپۆتە** (دەر.): مەساسەی جووتی.

**لاپۆرە** (کە.): چتی هەوایی و خۆڕایی. (ڕۆژ.، جەب.، زەن.، هەمە.): غەریب، ئاوارە.

**لاپووز:** لاپلار. پوازێکی بچووکە لەو سەری قەڵشاوی داری دەخرێت.

**لاپیتە** (دەر.): مەساسەی جووتی.

**لات** (باک.): تاتەبەرد، تەختەبەرد، پارچە، لەت. ــ کرن: لەت کردن. (ڕەوا.) بێ پوول وپارە، هەژار، نەدار، پەرێشان بوون. بەردی پان و لووس. لەلای تۆ. خاکی دێغکراو بۆ کێلان، ــ ی: نەداری. ــ بوون: پەریشان. ــ کردن: بێ پارە و پوول کردن. (ڕەوا.) ڕاز، جێگایەکی سەختە تەنها یەک یا چەند کەسی لێ ڕاوەستێ، ڕێگایەکی باریکە بەسەر تیوەڕاندا دەڕوا، ئەوپارچە پاناییانەیە کە بە بەرقەدی شاخانی عاسێوە دەبێ. (باد.) پارچەی بیستان و ئیدی. (دزە.) لە پارچە زەوییەکی گەورە بۆ چاندنێ، هێندەی بە دەست تۆی پێوەر دەکرێ، خەتی لێدەدەن و پارچەپارچەی دەکەن، بە هەر پارچەیەکی دەڵێن لات. لاتێک لە جووتیدا دە خەتە.

**لاتار:** گاشەیەکە لە بڵندییەوە بۆ خواری جاڵ بکرێتەوە.

**لاتاو:** توانج، پلار، پەلار، تەشەر، تانووت.

**لاتەراف:** گۆشتی خالیگە.

**لاتەنیشت:** لا، کن، کەچکانی. لەسەر ــ کەوتن: کەچکانی کەوتن. لەسەر ــ نووستن: لەسەر لایەک نووستن.

**لاترقەوج** (کە.، هەو.): ووتەی بێ مانا، چەنەبازی، قسەکەریی بێ مانا، چەنەباز و خوارو خیچ، قەمچوپیچ.

**لاتریکە** (هەورا.، کۆ.): خۆلادان، خۆ کلا کردن.

**لاتک** (باک.): لەتک، لەت. باخی چکۆڵە، باغچە.

**لاتیل** (موک.): گریشمە.

**لاج** (هەو.): لاتەنیشتی هێلکەیە، سەرو بنی نییە تەنها لاتەنیشتەکانییەتی.

**لاجان** (لاجانگ) (کە.): نێوانی گوێچکەو چاو، جینک، (هەورا.، هەو.، خۆ.، ڕەوا.) جینوک.

**جینیک** (زاخ.): (جا.) جانگییە، ئارۆشە، (باک.) جەندک، (باک.) جێندک.

**لاج لاج** (کە.): قومارچییە کە باش بزانێ، کەسێکە قوماری باش بزانێ. (موک.) پرچ و کاکۆڵی پڕ خەم و چین وشکەنە.

**لاجاوە** (موک.): دووپارچەقایشە کە لە لاجانگیدا ڕادەوەستێ و بەسەر کەلەوەیە.

**لاجوور**: نابەڵەد.

**لاجەک** (هەو.): لکی سەرپۆشی ژنانە کە بەری دەدەنەوە. (باک.) لاچک.

**لاچک** (خۆ.): لکی توورێێنییە. (ڕەوا.) لاسکی گیاو شتی تر.

**لاچۆ**: بڕۆلێرە. دوورکەوە.

**لاچۆپاچۆ**: شلەپەتە.

**لاچوو**: لابردراو.

**لاچوون**: کلابوون، شەلپین.

**لاچێ** (زمن.): بۆچ، بۆچی، لۆچی.

**لاخ** (شا.): کەد، لک، چووزەڵەی داروگیا.

**لاخستن**: کەمفرۆشتن، خستنەلاوە.

**لاخاجە** (خۆ.، ڕەوا.): لغاوە (ئی کەرشییە)، بۆ جنێویش بەکاردێ.

**لاخێز**: سێڵاو.

**لادان**: خستنەلاوە. لێ ـــ: وەلاکەوتن، هەلاکەوتن، شایف بوون، کەلی بوون، ڕاگومکێ، وەرگەڕان، کلابوون، بەولاوەچوون، کەنارەگرتن، چاوپۆشی، بەخشین. خۆ ـــ: لاترییەکە، تەوەسانەوە، دووری کردن و خۆکلا کردن.

**لادە**: کلابە، وەلاکەوە. گوڵێکی هەمەڕەنگەیە و بێ بۆنە. دیوارێکە لە تەپاڵە دروست دەکرێ. (کر.) بۆ دەبی کا.

**لاداو**: زلە.

**لادەر**: لابەر.

**لادەگا**: گوند، دێ، لادێ.

**لادڕ**: ڕەهۆڵ، تەڵشی هەراو لە زەویدا.

**لادڕگە**: شوێنێکە لەژێر بەردان ئاو هەڵیکەندبێ.

**لادراو**: لابراو.

**لادێ**: دێ، دەگا، (هەو.) گوند.

**لادێیی**: گوندی، گوندیاری، دێهاتی.

**لار**: جۆرە هەڵپەڕینێکە، خوار، چەوت، خووار، کەچ، لارولەنج.

**لاربووەوە**: خوواربووەوە.

**لاربوونەوە**: (کە.) لارەوەبوون.

**لارکردنەوە**: خوارکردنەوە.

**لارانەوە**: لەرانەوە، لەرینەوە.

**لاراندنەوە**: لەراندنەوە دەنگ یا دەفە و تیدی. گنگنۆک.

**لارە** (کە.): جۆرە گەفێکە. لارو لەنج.

**لاڕەشە**: دەردێکی پیسی مڕۆ و ماڵاتە لایەکی ڕەش ڕەش هەڵدەگیرێ و بێ دەرمانە.

**لارەک**: نێوی ئافرەتانە.

**لارەکە**: خوارە، چەماوە، لە لاربوونەوەت.

**لارەلار**: بە حاڵ جوولان، لارەوە.

**لارولەنج**: خاوخاو، (ژا.) نازونیو ناز. بە ـــ: خەرامان، نازوئیما.

**لارولەنجە**: ڕۆیشتنی بەناز، نازوگوز، لەنجەولار، بەنازەوە ڕۆیشتن، دڵبەرانە، ناز، نازو نیوناز، عیشوە.

**لارولۆچ**: خواروخێچ، تیلاوتیل، تی وتی. ـــ گرتن: لارولۆچ بوون.

**لاڕێ**: قاچاغەڕێ، ڕێگایەکە کلایە. ـــ کردن: ڕەتاندن.

**لاری**: خوواری. ـــ گرتن: لەڕێ کلابوون.

**لازۆر**: بەشی هەرە زۆر.

**لازووان**: گەوج، نازیرەک، بێ مێشک، نەزان.

**لازگ** (سل.): گێل، گەلحۆ، حۆل.

**لاژە** (باک.): لاوژە، لاوک.

**لاژەبێژ** (باک.): لاوژەبێژ، لاوک بێژ.

**لاژوارد** (باد.): کان، کانگە: لاجوارد. ـــ ی: کانگەیی.

**لاس** (فە.): ڕیخی گاو مانگاو ئێسترە. (کە.) فریو. لاس دان: فریودان، تەفرەدان، هەڵخەڵەتاندن. (دەر.) تەپاڵە، دەدەکیویلە. (بل.، ئاکۆ.) دروو، درک. دارێکە درووی لە ئەسی هەناری درێژترە و نەستوور و محکەمترە، بەری و گەلایی و چەشنی وە سنجوی دەچێ بەلاّن کیوییە. (خۆ.) سنجو، جوورە بەندێکە لە گۆرانیدا. (باد.) جێگا جۆخینێکە، کە گیای تێدا گیر دەکرێ. تەپاڵە.

**لاسا**: باسی. لاساکردنەوە: باسی کرن.

**لاسار**: خرس، سەهەندە، بێ گوێیی، گووێ پێ نەدەر، لامل، چەتوون، چەپخوون، کەللەڕەق، سەرڕەق، مەندەمودر، مەندەبۆر. ـــ بوون: شەهتاندن. ـــ یی: خرسی، شەهی.

**لاساوە**: ڕێژنەباران.

**لاسایی**: تیتاڵی، چاولێکەری، پەسخەلی، دەمەلاسکانێ، لاسە، (گە.) چاولێکەری، دەمەلاسکێ، دەمەزن. ـــ کردنەوە: چاولێکردن. ـــ کەرەوە: پەسخەڵ.

**لاسەرە** (کە.): جوورە خشلێکی ئافرەتانە.

**لاسەنگ**: بەرامبەر نە بوون. سەنگەلا، بارێکە تایەکی لە ویتر قورستر بێ. ـــ ی: سەنگەلایی.

**لاستێک**: جیر.

**لاسک**: لاسکی چەکمەو گۆوەی. لاسکی گیایان. توور، زل، قاسک، قاچک، لاچک، قۆپەن.

**لاس وخەزال**: یەکێکە لە دوازدە بەندە گۆرانییە کۆنەکان.

**لاسووره:** هەرمێ لاسووره. ئالیسۆر.

**لاسوڕ** (ڕۆژ.): سەرکردن، لەنیشانە نەدان، کلابوون.

**لاش:** بەدن، لەش. (خۆ.) بەردێکی نیوە ڕێکخراوە و نیوە تاشراوە بۆ خانووان.

**لاشاخ** (کە.): کێوێکە لایەکی ڕوخابێ.

**لاشاو** (کە.): لافاو.

**لاشە** (باک.): جەندەک.

لاشەخۆرە

**لاشەخۆرە:** دالاش.

**لاشەڕ:** کەنارگیر. ــ ی: کەنارگیری.

**لاشەویلکە** (زا.): لاشەویلاکە.

**لاشیانە:** کەناری دیوارییە لەنزیک چوارچێوەی دەرک و پەنجەرانە.

**لاعیە:** پرچی لاوە.

**لاف:** خۆ هەڵکێشان.

**لافلێدەر:** تەوتەوە، دەقتەڕێی.

**لافاو** (کۆ.): تیژاو، لاشاو، لێشاو، لیمشت، (بابا.) هەرەس، سیلاو، (باک.) پووک، لافاو هەستان.

**لاڤ** (بەروا.، دزێ.): جووان، لاو (تەنها بۆ نێرینانە).

**لاڤا** (باک.): تکا، پاڕانەوە. لاڤاکرن: پاڕانەوە، تکاکردن.

**لاڤانی** (باک.): لاوک.

**لاڤەبێژ** (باک.): لاوکەبێژ.

**لاڤەکار** (باک.): کەسێکە پیرۆزبایی (تبریک) بکات. لاڤەبوون.

**لاڤەلاڤ** (باک.): تکا، لالانەوە.

**لاڤلاڤک** (باک.): لاولاو.

**لاڤژ** (باک.): جوورە گۆرانییەکە، لاوژە.

**لاڤژۆک** (باک.): گۆرانی دڵداری.

**لاڤژەبێژ** (باد.): لاووک بێژ، گۆرانیبێژ.

لاق

**لاق:** پێ، قاچ، باق، پەی، لنگ، لینگ، (باک.) بۆق.

**لاقەتار:** ٦ــ٧ دێراوێک یان ڕێزە دێراوێکە کە بە یەک جۆگە ئاو بدرێ.

**لاقەڕتێ:** جوولە، مەڕو ماڵاتی کوژراو.

**لاقرتی:** نالەبار، لاقردی. ناتۆرە.

**لاقردیی** (جز.): نالەبار، ناهەموار، گالتەو سوحبەت، گەمە، بێ نەزاکەت و بێ ئەدەبی. ناتۆرە.

**لاقۆزە** (هەو.، کە.): گندۆرەکە جێگایەکی بڕێک تاڵ و باقییەکەشی زۆر شیرینە. جوورە کاڵەکێکی چکۆڵەیە کە لایەکی کەمێک خوواربێ.

**لاق ولەتەن:** پاوێل، پێ وێل، پێچک، قاچ وقول.

**لاک:** دوو سەرەداران بە نیرومێ لێک قایم کردن. (هەورا.، کە.) کەلان، لاشە، کەلەش.

**لاکە:** جوولانێکی زۆر بێ هێزە بۆ نەخۆش و برینداران بەکاردەبرێ: لاکەی سەری دێ، دەنگی دێ.

**لاکەل** (کە.): جوورە تفەنگێکە.

**لاکەوتن** (خۆ.): لادان، کەنارکەوتن، دوور کەوتنەوە. وازلێهێنان.

**لاکردن:** لادان.

**لاکردنەوە:** ئاوڕدانەوە، ڕوو وەرگێڕان، یارمەتیدان.

**لا لێ کردنەوە:** ئاوڕلێدانەوە، یارمەتیدان.

**لاکۆ** (کە.): بە کرێ قۆزاخەی پەمۆ چنینەوەیە کە لەجیاتی کرێش هەر پەمۆی بدرێتێ.

**لاکۆت** (باد.): خۆتێپەڵقوتین.

**لاکۆشکە:** تەرەفداری.

**لاکۆشی:** لاکۆشکە، تەرەفداری.

**لاکووت:** بەرکووت (ئی خەرمانی). (کە.) تاوان کردنی ژن ومێرد لەگەڵ یەکتری بەداوێن پیسی لەتەک بیانیاندا.

**لاکێش:** جوورە فەرشێکە، (هەو.) مافوور یا لباد یا بەڕەیێکە درێژییەکەی زۆر لە بەرینییەکەی پتربێ. تەرەفداری، لاگیری.

**لاکێڵ** (کە.): جووتبەندەیەکە، کە زەوی دێیەکی دیکە بکێڵێ.

**لاگا:** جێگەی پشوودان لە دەشت ودەر، لادێ. ــ یی: دێهاتی.

**لاگرتو:** لاگرتوو.

**لاگر:** لاکێش، ملگر. قایشکێش، پشتگر، لاگیر، لایەنگیر.

**لاگرتن:** پشتگرتن.

**لاگوێل** (ڕۆژ.): گۆلم، لوێچ.

**لاگیر** (موک.): هەڤاڵدار، لایەنگر، پەیڕەو، پشتگیر، قایشکێش. (هەورا.) یانیگر، لایەنگیر، نهانیگر، سەگی نیهانیگر، پشتگر.

**لاگیرە** (کە.، هەو.): جوورە خشڵێکی زێڕە بە پێشسەرێدا دەکرێ. زنجیری زێڕ یا زیوە بە کەناری شەدە و هەورییەوە دەدروێ کە شەدە یا هەورییەکە لەسەر نرا لە هەردووک لاجانگییەوە لاگیرەکە دیارە. زنجیرەکە گەلێک کەس لیرەپوولی زێڕ یا زیوی پێوە دەکەن.

**لاگیری:** پشتگیری، پشتگری، پێڕەوی، قایشکێشی، لایەنگیری.

**لال** (نەهـ.، باک.): کن، لا. (هەورا.) خاڵ، لاڵۆ. (هەورا.) جووان، دەلال، قشت.

**لاڵ:** بێ زمان، لەعل. (باک.) لال، لال بوون، لال کرن، لالمان.

**لالانەوە:** کارەکاری، لاڤەلاڤ، ڤاڕین، کارەکار، پاڕانەوە، مەهدەرڤانی، هاوارکردن، لالەژن.

**لالایی:** لالایی گاتێ: زمانی لاڵ بێ.

**لالە** (دەر.): کاکە، برای گەورە، نێوی ئافرەتە. (لوڕ.) لالۆ، خاڵ (برای دایک). لامپا، جوورە چرایەکە.

**لاڵە:** پاڕانەوە، لالانەوە.

**لاڵەپەتە:** لاڵەپەتە، پەڵت، ئەو کەسەیە قسەی بە زەحمەت بۆ بێت، لاڵەپتە: فسەزمان، فس زوبان.

**لالەڕەنگ:** نێوی ئافرەتیە.

**لالەزار:** گوڵزار.

**لالەڕوو:** نێوی ئافرەتیە.

**لالەزان** (باک.): ئیتیلاعاتی سەربەیێ.

**لالەش** (باک.): شوێنێکی پیرۆزە یەزیدیان هەموو ساڵێکی لە جەژناندا زیارەتی دەکەن. نێوی کێوێکە لە کوردستاندا کەوتۆتە خاکی یەزیدییانەوە.

**لالانگی**: جورە پرتەقاڵێکە.

**لالۆن** (باک.): لالانەوە، پاڕانەوە.

**لالانەوە**: پاڕانەوە، لبەرگەڕیان.

**لالاندنەوە**: پاڕاندنەوە.

**لالۆ** (هەورا.، زەن.، لوڕ.): خاڵە، خاڵ.

**لالۆزا** (هەورا.): خاڵۆزا، خاڵەزا، پسخاڵ.

**لاڵ وپاڵ کەوتن**: بە ماندوویەتی یا بە نەخۆشی یا بە کووژراوی لاڵ و پاڵ کەوتن و بە ناڕێکی ڕاکشان.

**لالووت**: نارەزایی، زویر، لووتخوار، مۆن، گرژ. ـــ بوون: ڕوونەدان.

**لالی** (باک.): چێشتێکە.

**لاڵی**: خرس.

**لاڵییانەوە لە خودا**: پاڕانەوە لە خودا.*

**لام**: لەلام: لە کن من. (باک.) ڕوومەت. عوزر.

**لام** (باک.): گووپ.

**لامەمکە**: مکیک (لامژ)، کەسێکە منداڵێکی خەڵکیش لەگەڵ ئی خۆی شیر بدات.

**لامپا**: چرا.

**لامچی** (باک.): ڕوومەت.

**لامل**: لاسار.

**لامژ** (باد.): کەسێکە جغارەکێش بێ بەلاّن چ هەڵنەگرێ.هەر لێرە و لەوێ وەرگرێ.

**لامنجی** (کە.): قەرزکوێر.

**لام وجیم**: پەت پساندن، سەرکێشی کردن.

**لامۆفەک** (باک.): بەزاج نەکێشان، شۆرش، سەرپێچی.

**لامێژ** (کە.): ئەو بەرخ و کارەی کە بە شیری دایکی خۆی قایل نەبێ و پەلاماری نیدیکەش بدات.

**لامییژەک** (باک.): لای خوارەوەی ڕوومەت.

**لاپیش** (زەن.): پاییز.

**لان**: لایەن، لان گرتن: لایەنگرتن. (باک.) هێلانەی دەعبایان و جانەوەرانی کێوییە. لانی شێری.

**لانە** (فە.): هێلانە. (زا.) وەکر. سلک.

**لانەواز** (هەو.، هەورا.، کە.): مهاجیر، مشەخت، لەماڵ و نیشتمان دەرکراو. لانەواز بوون. لانەوازکردن.

**لانەوازی**: دەربەدەری، ئاوارەیی.*

**لانت** (باد.): کۆسپە، جێگایەکە کەمێک بڵندبێ.

**لاندک** (ئاک.، باک.): لانک.

**لانک** (باک.): دەرگوش. (ئاک.) لاندک. (بابا.، هەورا.) بێشکە.

**لەنگ ولۆری** (موک.): لەنگی وکەچی.

**لانکەپیچ** (ئاک.): پنجە گیایەکە بە زەویدا ڕادەکشێ، لەنێو باغچاندا دەبێ، گوڵی زەرد و ووردی بەقەد دەنکە جۆیەکی دەبێ.

**لانگرتن**: تەرەفدارکردن.

**لانگیر**: سەگی در.

**لاوبوون**: گومان، سوو.

**لاواز**: تەشک زراف، (باک.) جیبقال، پووت، کەمتین، بێ تووک، بێ تیاب، ڕژیی، هەلی، ئیرەتی، مردگ، ناشقۆرت، بزمۆک، دالگۆشت، لەخەر، گەرنسزە، لەر، باریک، زراو، ڕاژیی، وەزا، چەکاڵ، بێ تینی، گەریینە، لاراهی، چیپلاژ، (هەورا.) شێرمردە، چەڵم، چەپحۆڕ (بۆ مرۆیە). ئاواز لە گۆشەیەکەوە، ڕێگابکاتەوە. ـــ بوون: چروسانەوە، هەجنین. ـــ یی: دڕژانک، کەمتینی، ڕژیتی. بێ تیابی، (باک.) چلەگ. لاواز کردن: هەجناندن.

**لاو**: لاڤ: خۆشەویست، دەلال، خوێن گەرم، ڕووال، جحێل، جاحێڵ، جاهێل، خورت، گەنج. کوڕ، لاوی من: کوڕی من. ڕەند، تولاز، گەنج، جووان، شۆخ، شەنگ، تەڕلان.

**لاوانە**: بڕوانە (لاشیپانە).

**لاوانەن**: گۆزانەوە.

**لاواندن**: دڵدانەوەی منداڵ.

**لاواندنەوە**: میهرەبانی کردن، ڕووەدان، گۆزاندنەوە، دڵدانەوە. ڕقۆ، ڕقی، ڕقووی گۆرانی.

لاواهی: تکاکردن.

**لاوەنان**: بڕوانە: بەلاوەنان.

**لاوە**: جوایەز، جوودا، جیاواز. بەلاوە: هەندەر، هەندەران، دەرەوە. نێوی پیاوانە.

**لاوچاک**: قۆز، قەنج، قنج، کوڕەلاو، بژۆن، لاوێکی سەخیی و ئازا، جواچی، شۆخ و شەنگ. نێوی کوڕانە.

**لاوچاکی**: جحێلی، کۆکی.*

**لاوژە** (باد.): گۆرانی، ستران، لاژە، لاڤژ، لاوک، جۆرە گۆرانییەکی دڵدارییە. کوڕێژگە، کچ بانگی کوڕ بکا یا لە گەڵی باخۆی بەکاری دەبا. گەورە لەگەڵ گچکە قسە بکا دەڵێ: کوڕێژگە، کوڕە.

**لاوژەبێژ**: گۆرانیبێژ.

**لاوکۆ**: کوڕێژگە.

**لاوەلا**: ڕێگایەکە بە بەرقەدی کێویدا بڕوا.

**لاوکبێژ**: لاژەبێژ، لاڤەبێژ.

**لاوک**: گۆرانی، ڕاو، (باک.) گالگالک، لاوژە، لاوژ، لاژە، لاڤە. گۆرانی، ژیکەلە، خۆشەویست، جحێلی، لاوکۆ.

**لاوکۆ**: لاوی جحێل.

**لاولاو**: نێوی ئافرەتییە.

**لاڤلاڤک**: گوڵێکی کێوی و دەستچینە، بەهاری و هاوینییە.

**لاولاوە**: گوڵێکی ناسراوە تووڵە داوێ و بە دار و دیواران هەڵدەچێ گوڵی هەموو ڕەنگەی هەیە و بێ بۆنە، گوڵەکەی وە بۆڕی گرامافۆنی دەچێ و تۆوەکەی بە دژشاوەوە. ڕیزە، ڕیزەکەر. لاولاوەی دەکی. زیلان.

**لاولاوەی کێوی:** مالویچە.

**لاوێتی:** هەرزەکاری، جحێڵی، جاحێڵی.

**لاونیو:** لارلا.

**لاونای** (هەورا.): لاوانەوە.

**لاونیۆ** (هەورا.): لاواندنەوە.

**لاویچ:** پڕ بە دەستێکە، (هەورا.) لەویچ، (باک.) بۆقک، لویچ، گۆلم، (ڕۆژ.) گوریل، لاویچێک: مستێک.

**لاویژە:** تازەجوان.

**لاوێن:** چۆمێکە سەرووچاوەی لە دێی زێوکە و ماشکانە لە وێوە دێت بە نێو هەردووک لاجاناندا تێدەپەڕێ لەدووای سنووری پیرانێدا تێکەڵ بە ڕوباری نەڵێنی دەبێت.

**لاویی:** شاخینی، جحێڵی، گەنجی، تۆلازی، جوانی.

**لاوییتە** (کە.): مەساسە، بیڵەکان، جوورە قوڵینگێکی دووسەر و سووکە سەرێکی تیژو سەرێکیشی پانە.

**لاوێتی:** جحێڵی.

**لاوییژە:** لاوژە، کوڕەلاوژە، کوڕیژگە، بۆ بانگ کردنی کوڕان بەکاردێ.

**لاویژگە:** کوڕیژگە.

**لاویی** (باک.): جحێلاّیەتی.

**لاوییی** (باک.): جحێلاّیەتی، لاوێتی.

**لاهەڵیچەڕاو:** بێ مشوور، بێ هۆش، بێ عەقل، کەسێکە بێ مشوور بێ.

**لاهێر:** زەلامێکی قەڵافەت زل و ناهەموار و وێ نەچوو، فیلەتەن، مەندەبوور، مەندەبۆر، لەندەهۆر.

**لای** (باک.): هاتە لای من. کاڤار، هەرێم.

**لایەن:** لا، کن، نک، لان، لاگیر، لایەنگیر، لایەنگر، بێ لایەن: بێ لایەنگیر.

**لەلایەن:** لە لای.

**لایەنگر:** لایەنگیر، لاگیر، پشکەگیر. ـــ ی: لایەنگیری.

**لایەنگرتن:** تەرەفگرتن.

**لایەنگیر:** لایەنگر، قایشکێش. ـــ یی: لاگیریی، لاگریی، قایشکێشی.

**لای تۆمان باش، خۆش:** بێتی بەخۆشی، خواحافیز.

**لای ژووروو:** لای باکوور.

**لای لایێ:** گورگانە شەوێ، جوورە گۆرانییەکە دایک لەکاتی نواندنی منداڵدا دەیڵێت. (باک.) بەر دۆلایی. لای لایی کردن: لۆراندن، لۆرین.

**لایێ هێ** (بار.): وێندەرێ. لە لایێ هێ: لەوێندەرێ.

**لە** (موک.): دە، لەرێیە: دەرێیە. لەخۆم ڕادەبینم، ئەمز دخۆ ڕادبینم. د، ل، دەددڕ، (سۆ.، موک.) لەنێو، دەنێو، دە، تۆولۆ، تووێ. (باک.) دە، ژ، چ، نە، (هەورا.) گۆ، نەچ، (لو.) ئەز.

**لەناکاو:** جەناکاو.

**لەبا:** لەکن، لەلای.

**لەبات** (باک.): ئەندام. ـــ ی: لەبری، لەجیاتی.

**لەبار:** ڕێک و پێک، سازگار، زیرەک، کارزان، ڕێک کەوتوو. لە بارابوون: توانایی، لێهاتوویی، قابلییەت.* نارەوا: لاقردیی. ـــ ی: ڕێک وپێکی.

**لەبارە:** لەحەق، دەرحەق، بەنسبەت.

**لەباربوونەوە:** زان. بریتییە لە منداڵ بوونی ژن.

**لەباک** (باک.): فرلداخ باز، دەسیسەباز، فێڵباز.

**لەبان** (بابا.): جەگەن.

**لەبەر:** لەبەردابوون: خەریکبوون. لەبەر ئەوەی کەنە. بە هۆ، ژبەر، (جا.) ئەگەرێ، (هەورا.) لەوەر. لەبەردێ، سەبارەت، لەبەرکردن: ژبەرکردن، لەبەرئەوەی: چونکو، لەبەربوون. پێ لەبەرکردن.

**لەبەرچی:** ژبەرچی.

**لەبەرئەوە:** بۆیە، ژبەرئەوە. بڕوانە: لەبەرئەوە.

**لەبەر ئەمە:** بڕوانە: لەبەر ئەوە.

**لەبەردان:** بریتییە لە لەنێوبردنی ماڵ.

**لەبەرچوون:** هێنانە دونیای منداڵی مردوو.

**لەبەردڵان:** خۆشەویست، ئازیز.

**لەبەر ڕۆیشتن:** ڕەوان بوون، جاری بوون.

**لەبتاندن** (باک.): جوولاندن، بزاوتن. بلەبتێنە.

**لەبتین** (باک.): جوولان، بزووتن.

**لەبری:** لەجیاتی. (هەورا.) جیای.

**لەبزیینە** (باک.): هەویریی گەزۆو بادام، لەوزیینە.

**لەبکاندن** (باک.): ماندووکردن، بلەبکیینە.

**لەبکینی** (باک.): ماندووبوون، بلەبکە.

**لەبلەبی:** نۆکاو.

**لەبۆ:** بۆ، ژۆ، بۆچی.

**لەبێ** (زا.): بەڵێ. (باک.)ئایایی، چاکە.

**لەبیبخە** (باک.): چێتێکە لەسەر بریان دادەنێن.

**لەبیر:** لەهزر، لەیاد. ـــ بوون: لەیادبوون، فەرامۆش نەبوون. ـــ چوون: لەیادچوون.

**لەپ** (سنە.): وە لەپ کەوتن: کەوتنەدەست. قەپاڵ (فە.، زا.) لەپی دەست: بەری دەست. (باک.) پەنجە، پێ، دەلاقەریەنجەمرە. لەپ هلاتین: هێرش بردن، دیفاع لە خۆکردن. بجارلەپکان: بە چوار پەلان. (ڕۆژ.) چڵپاندن: سەگ بە زمان کە ئاوی بخواتەوە یا زمان لە چێتێکی تردان. (باک.) لەپاندن، فریودان، هەڵخەڵەتاندن (بلەپتینە). ئالیینۆک، (ڕەوا.، هەورا.، خۆ.) ئاریینۆک، (هەورا.) لەتکەنۆک، (سەق.، هەورا.) نەخۆشەر. لەپی ساوار: (هەورا.) شلەساوار، لەپی برنج: (هەو.) شلەبرنج، (کە.) پلاو.

**لەپاکەوتن** (ڕۆژ.): لەپێ کەوتن.

**لەپەکوتێ** (کە.، ڕۆژ.): لەپەکوتی کردن، پەل کوتان وەکو کوێران بۆ چت دۆزینەوە، دەست کوتان، چەنگەپڕێ. لەپەوڕوو: بەسەر دەست و ڕووداکەوتن، لەپەو ڕووچوون، لەپەو ڕووکەوتن.

**لەپڕ:** لەناکاو.

**لەپڕا**: ژنشکاڤە، نیشکڤە، لەھیکرا.

**لەپک** (باک.): دەستەوانە.

**لەپکە** (ھەو.، خۆ.): کووژەکە، دوگمە.

**لەپماڵ** (ڕۆژ.): کۆکردنەوەی چتمەک بە دەس.

**لەپۆرت** (ھەورا.): نانی ھەنجیری.

**لەپۆک** (باک.): فریوباز، ھەڵپەلەپتی. ــــ ی (باک.): فریبو، گوڵ پێدان.

**لەپن**: زۆرخۆر، چڵێس، خۆرا، چل، چلەک.

**لەپێش**: نێزیک، ژبەر.

**لەت**: زوولاک، ساد، پارچە، تیلمە، کەر، لەتک، کوت، کەرت، نیبیوە، کەرک، لەم، لاتک، نیبیڤ، کووز. لەتبوون: پارچەبوون. لەتکردن: پارچەکردن، بڕین، قەدکردن، شەق کردن، پەلکردن.

**لەتە** (کە.): دەرۆزە، سواڵ.

**لەتەچن** (ھەورا.): سواڵکەر. ــ ی (کە.): دەرۆزە.

**لەتەچیینی** (کە.): سواڵکەر.

**لەتەرە** (ھەورا.): تەشی. سەرلەتەرە: سەرەتەشی.

**لەتەرێ** (ھەورا.): تەشی، سەرلەتەرێ: سەلکەتەشی.

**لەتەک**: لەگەڵ، لەلا.

**لەتەک تۆ**: لەلای تۆ.

**لەتر** (ڕۆژ.، کە.): پاڵ پێوەنان، ــ بردن: بەدەما چوون، بەلاداھاتن.

**لەتک**: لەت، پارچە، لاتک. لەتکە، پارچەپارچە، نیبیڤانی.

**لەتکە**: لەتکە ھەرمێ و سێو ئیدی و شککراو. لەتکە خۆخ، لەتکە ھەنجیر.

**لەتکەخشت**: زەنگوڵ، ئاجوور، پارچەخشتی ناڕێک، (شار.) خرچان.

**لەتکەنۆک** (ھەورا.): لەپە.

**لەتلەتە**: پارچەپارچە.

**لەت وپەت**: بڕوانە: لەتلەت.

**لەت وکوت**: ھەپروون بە ھەپروون.

**لەج** (باک.): شەڕ.

**لەجێگەچوو**: ڕاگیراو، لەجێگەچوون: ڕاگیران.

**لەجیات**: لەبر، لەبریتی. ــ ی: لەباتی، لەبرێتی.

**لەچە**: بڕوانە: لەچی.

**لەچەر**: ڕەزیل، چروک، ڕژد، بەرچاوتەنگ، بەرجل، قڕنووس.

**لەچەریی**: ڕەزالەت، (ھەورا.) دەستماڵ.

**لەچەک** (کە.): لەچک، لفکەی شەدە.

**لەچک** (ھەو.): لچکی پێچی پیاو و ژنان، لفکەی شەدە، دەسماڵی ژنان.

**لەچی**: لەوەی کە.

**لەحیم** (ع.): لەحیم کردن، ڕاکووتان.

**لەخاوە** (ڕموا.): لخاوە.

**لەخەم** (ھەورا.): نۆینە، (ھەو.) نۆیین.

**لەخەر** (شار.): لەغەر، لەڕولاواز (بۆ مەڕو بزن و تەنھا بۆ ماڵاتان بەکاردێ).

**لەخت** (ڕۆژ.): لەش، بەدەن، قالب.

**لەختە** (کە.): پارچە، کووت.

**لەخشە**: خەریتە، پلان.

**لەخش** (ڕۆژ.): جوولە. لەخش بوون: جوولان.

**لەخشتە**: فریو، تەفرە، لەخشتەبردن: دەست بە زاخا کردن.

لەخشتەبەر: فریوبەر.

**لەخشیاو** (ھەورا.): ئێشان. (ھەورا.) دڵ لەخشیای.

**لەخۆبوردن**: دەست لە ژیان بەردان بۆ ئامانجێک.

**لەخۆچوون**: بوورانەوە، لە ھۆش چوون.

**لەخۆبوونەوە**: کاربردنەسەر بە تەواوی.

**لەخۆڕادیتن**: لەخۆڕا پەرموون.

**لەخۆڕادیتوو**: لەخۆڕا پەرموو.

**لەخۆدەرچوو**: لەخۆ بایی بوو.

**لەخۆوە**: لەخۆڕا.

**لەخۆیەوە**: سەربەخۆ.

**لەدەست چوو**: نەماو.

**لەدەست چوون**: نەمانی شتێک، کە ھەبوو. لەدەست دان.

**لەدەست دان**: لەدەست چوون و گوناھ لە خێوی بوون.

**لەدەست دەرچوون**: بڕوانە: لەدەست چوون.

**لەدەست ھاتن**: پێ کران.

**لەدووداان**: موافەقەت لەتەک قسەی کەسێکیدا کردن، بۆشل کردن. زۆر لێ قبووڵ کردنی منداڵ و نۆکەر.

**لەدووگەڕان**: بەدوادا گەڕان.

**لەدەم دەرپەڕین**: لەدەم دەرچوون. قسە بە ھەڵەکردن.

**لەڕ**: مردگ، مسری، لەخەر، لەغەر، چەکاڵ، چەلم، داڵگوشت، لاواز، بێ تووک، پووت، ئاشقۆرت، بزمۆک، بێ تین، چرچ، چوورچ. ــ ی: بێ تینی، لاوازی، پووتی.

**لەڕاست**: لەئاست، لەبەرامبەر.

**لەرانەوە**: لارانەوە.

**لەراندن**: لەراندنەوە، لەنگاندن، لەرزاندنەوە.

**لەراندنەوە**: لەنگاندن، لاراندنەوە.

**لەرە**: لەرەکردن: لەریان، لەرینەوە، لارانەوەی دەنگ و دەفەو لەرزینەوە و جوولانەوەی لەرەیەکی تەواو: بۆ جوولاندنەوەی گۆشتی ڕومەت و سمت و ڕان و ئیدی بەکاردەبرێ.

**لەرزانە**: جورە خشڵێکی ئافرەتانە بەکڵاوەوە یا بە شەدەوە دەکرێ. (ڕموا.)بسکۆڵە، بسکۆکە.

**لەڕە** (کە.): لاواز، لەڕ.

**لەرز** (بابا.، ھەورا.): لەرزۆک، دەردێکە ئەندام و سەر لەرز دەکات.

**لەرزان:** بەراد. بوومەلەرزە.

**لەرزانەوە:** لەرزاندن.

**لەرزاندن:** ڕاچاندن، وەلەرزخستن، جوولاندن، جماندن، هەژاندن.

**لەرزە:** جوولە. وەلەرزخستن: جوولاندن.

**لەرزەک** (باک.): لەرزۆک، شەپڵەلێدراو. (دەر.) جێگایەکی گڵەسوورە دووای بارانە دەبێتە قوڕێکی وا کەسی لێ دەرنەچێ.

**لەرزەلەرز:** جوولەجوول.

**لەرزۆک:** (هەو.) لەرزەک، لەرز، لەرزینەک.

**لەرزۆتا:** چۆقان، چۆقین، لە سەرمان یان لەبەر نەخۆشی، (ڕۆژ.) بقەبقە.

**لەرزین:** جمەیین، جوولان.

**لەرزیینەک** (باک.): لەرزۆک.

**لەرزینەوە:** جوولانەوە، هەژانەوە.

**لەرۆک:** لەرزۆک.

**لەروو** (زا.): ڕووبەڕوو. جوان و ژیکەلە. لەپێش. ــ ی: ڕووبەڕوویی.

**لەرولاواز:** چەرمەچەقاڵتە.

**لەریانەوە:** لەرانەوە.

**لەرێگەدەربردن:** لەرێگەدەرهێنان.

**لەرین:** لەرەکردن.

**لەرینەوە:** لارانەوە، لەنگان.

**لەرینەوەی ژێیەکان:** لەرانەوەی ژێیەکان.

**لەرینەوەی ناچاری:** لەرانەوەی بە بێ خواست.

**لەز** (باک.): بلەز: بەپەلە، بلەزوبەز: بە پەلەپەل، پەلە، تالووکە، ساتی، گورج، زوو. بە ــ : بە پرتاوی، بە تالوکە، بەگورجی، بەزوویی، بەساتی. ــ بوون: پەلەبوون، ــ کرن: پەلەکردن.

**لەزاندن** (باک.): بلەزینە، تالووکەکردن.

**لەزگ:** پێگرتن، خەریک. ــ ی (باک.): جۆرە تفەنگێکە.

**لەزگین** (باک.): زۆر بەعەجەلە، زۆر بەپەلە، بەتالووکە.

**لەزۆ** (باک.): بەتاڵووکە، پێشڕەس.

**لەزیان:** (باک.) لەزین، بەتالووکە.

**لەزین** (باک.): تالووکەکردن، هەڵپەڕین، هەڵخلیسکان.

**لەسەر:** قەرزار، لەسەرمە: قەرزدارم. لەبەر: (لەسەر تۆ دووریان خستمەوە). پێویست، گەرەک.

**لەسەرچوون:** وازهێنان لەکارێک، کە دەکرێت. لەبیرچوون.

**لەسەرەخۆ:** هێوران، هێمن، بەکاوەخۆ، لەسەرخۆ، خوێن سارد، نەخت: نەختە، کەمکەمە، پیچ پیچە، تۆزتۆزە، بەرەبەرە.

**لەسەردەستان:** لەسەرزان، کاتی زانێ، دەڵ، دەڵەدەڵ، لەسەردەستانە: لەدەمی زانیندایە.

**لەسەرکردنەوە:** هاریکاری کردنی کەسێک لە بەرامبەر ناحەز.

**لەسەررۆ:** بەردەوام بوو.

**لەسەر ڕۆیشتن:** لەسەر ڕۆیین، ئەمر پێ کردن، فەرمان و حوکم کردن.

**لەسەر ڕۆیین:** لەسەر ڕۆیشتن.

**لەسەریەکتی:** بە سەر دابڕاو، بە سەردا سەپاو.

**لەش:** قالک، مر، ڕیزە، جەستە، لەخت، بەدەن، بەشەن، (باک.) کلۆخ، بەچک، قەن، قالب.

**لەش بەبار:** نەخۆش، دەردەدار.

**لەش پیس:** کەسێکە، کە وسڵی لەسەرە.

**لەش ساخ:** باش، خۆش، لەش پتەو، تەندروست، (باک.) ئیڤنۆتە. لەش ساخ بوون: (باک.) بژیینی، بەدەنساخی، تەندروستی، (باک.) ئیڤنۆتەیی.

**لەش ساخی:** تەندروستی.

**لەش سووک:** لەش سڤک. ــ ی: لەش سڤکی.

**لەشکەر** (باک.): لەشکر.

**لەشکر:** بتۆم، پێگەهـ، سپا، لەشکەر، (باک.) سوپا، ئوردوو، هۆردوو، هۆردی.

**لەشکربەز:** لەشکرگە، هۆردوبەز.

**لەشکرگا:** هێز، هۆردوبەز، لەشکربەز، سپاخانە.

**لەشکرداریی:** سوپاداریی، سوپاسالار، (باک.) لەشکرزیی.

**لەشکری:** لەشکری کوردستان: سپای کوردستان، جوورە گۆرانییەکە، یەکێکە لە دوازدە بەندەکان.

**لەشگران:** تەمبەڵ. ــ ی: تەمبەڵی.

**لەشیر بڕینەوە:** منداڵ لە شیری دایک گرتنەوە.

**لەشی:** تەنانی، بەدەنی.

**لەعلی بێ دان** (موک.): جۆرە ترێیەکی سوورە و بێ دەنکە، گلووری هێندەی مازووییێکە و خڕە.

**لەعل:** لاڵ. بەردێکی بە نرخە.

**لەغ** (کە.): گرێ، دەڵۆ. لەغی تێ خست: کارەکەی بە جێ نەهێنا، گرێی تێ خست.

**لەغامە** (ڕۆژ.): لغاوە، لالغاوە، سووچی هەردووک لای زاری.

**لەغەر** (کە.): لاواز، لەڕ، بێ تووک. ئەو جۆگەیەیە کە سەری پۆشراوە، نەغەم.

**لەغەم** (کە.، موک.): جۆگەی سەرپۆشراوە، لەغەر.

**لەف، لف** (باد.): قووت چوون. لەدەورە ئالان.

**لەفەن** (باد.): قامیش.

**لەق** (خۆ.): ئاوەژووی پتەو مەحکەم و قایم. (ئەردە.) لق.

**لەقان:** لەقیین، پەک خستن.

**لەقە:** جووتە، جفتە، لووشکە، لەقە ئاویژتن، لەقەلێدان، لووشکەلێدان.

**لەقاندن:** لەراندن، پەمهینی دان. لەقە بە دووپێدان: جووتە، (دەر.) جفتە، لووشکە، جیفوک، جووتەیەکە تەنیا بە لاقێکی لێ بدات.

**لەقەتکان** (باک.): خۆشەچینی، گوڵ هەڵگرەوە.

**لەقەلەق:** هێواش هێواش، لەق ولۆق.

لەقلەق

**لەقەم** (خۆ.): ڕەخنە، بەزاڤیت.

**لەق ولۆق**: شەق وشۆق، مرۆی شل و شۆڵ.

**لەقلەق**: لەگلەگ.

**لەقنای** (هەورا.): لەقاندن.

**لەقین**: لەقان.

**لەک** (کە.): سەد هەزار. (باک.) دەهەزار، تیرەیەکە لە لوڕ و شێوەی ناخەوتنیان زۆر سەختە.

**لەکار خستن**: بێ بەهرەبوون.

**لەکار دەرهاتوو**: بەهرەوار، کارامە.

**لەکار کەوتوو**: بێ سوود، بێ بەهرە.

**لەکان** (باک.): کەوانەیەکی دەسکدارە، تۆپی پێ داوێژرێت (ڕاکێت).

**لەکۆلەرۆ**: نزای بەد.

**لەکوێ**: جەکۆ، چکۆ، لەکوێیە: چکۆن.

**لەکیس چوو**: لەدەست چوو.

**لەگام** (جا. کە.): گەوج، خوێری، بگەڕ، کەسێکە زۆر ماڵان بگەڕێ، گەڕیدە. ــ ی (کە. جا.): گەوجی.

**لەگە** (هەو): لەگەڵ. لەچی، لەگەچوون: لەجێ چوون.

**لەگەڵ**: ڤیرا. لەگەڵ ئەوەش: گەل ڤێ قاسێ، لەگەڵ ڤی قاسی: لەگەڵ ڤی هەندی: ژوێڤە. لەگە، لەگەل، لەتەک، پێکەوە، دەگەڵ، پەریی، چەنی، لەگەڵ یەک: دگەل هەڤ، پێکەوە.

**لەگەن**: دەستشۆ، قاپی مس.

**لەگەنۆک** (باک.): دەستشۆی چکۆڵە، قاپی مسی چکۆڵە.

**لەگرە**: لێرە.

**لەگرنە**: لێرە، ئەلێرە.

**لەگژ** (دزە.): خەریک، مەشغوول. ــ یی: خەریکی.

**لەگلەگ**: بەقەدەر کەلەبابێکی زەلام گەورەیە بەڵان لاقی و دندووکی درێژن.

**لەگۆبردن**: لەسەرمان: لەگۆچوون.

**لەگۆچوون**: لەجووڵکەوتن.

**لەگوێینە**: لەگیینە.

**لەگیینە** (کە. کۆ. هەو.): ڕەنگە، پێم وایە، (خۆ.) لەگوویینە.

**لەل**: ناتوانێ بڵێ لەل، دەتوانی بڵێی لەل.

**لەلە** (فە.): لانک، بێشکە. دارێکی باریکە چەند جێگایەکی نیشانە کرابێ بۆ زانانەدنی چەندێتی شیری. نۆکەری تایبەتییە بۆ بە خێوکردنی منداڵی چکۆڵە، دایە.

**لەلەنگی** (باک.): نێوساجی، ناوسێلی.

**لەلو** (هەورا.): جۆلانەی منداڵی، ڕاژاندنی ونواندنی.

**لەلەیتی**: لەلەیی، لەلایەتی.

**لەلو** (فە.): لانک.

**لەلۆ**: جۆلانە.

**لەلووە** (هەورا.): جۆلانەی منداڵان کە تێیدا ڕادەژێنرێن.

**لەلووک** (هەو.): لانکێکە لە نێوانی دوو داری کە هەر یەکە دوو پێی هەیە.

لەلووک

**لەلووک**: لەیلوک، چەرخ و فەلەکی جێژنان، چەرخ و فەلەک، جۆلانە، لوولک، (هەورا.) لەلووە.

**لەم** (هەورا.): زگ.

**لەماک**: فێڵباز.

**لەمانە**: لەئەم چتە نێزیکانەی دەوروبەر.

**لەم ئیشە** (هەورا.): زگ ئێشە.

**لەمە** (هەورا.): زگ، سک، لەمەبەدەر: ژڤێ پێڤە.

**لەمەڕ**: نی، هی، خۆمەڵ، سەروە کەسێکی بوون، ئارزیی. دەربارەی. سەبارەت.

**لەمەوبەر**: لەوەپێش.

**لەمەودوا**: لەوەپاش.

**لەمەولا**: لەییولا.

**لەمبواز**: لمبۆز و قورغی فیلی.

**لەمرک**: ئانیشک، ئەنیشک، هەنیشک، مرک.

**لەمبووز** (باد.): لمووز، لمبۆز، بە قورغی فیلیش دەڵێن.

**لە منت کەوی**: بۆ هاندان، سوپاست دەکەم، ئافەرین.

**لەمیە** (کە.): چرا.

**لەمپەر** (موک.): پشتەک، پشتیوان، پاڵەوپشت.

**لەملاوە**: لەولامە.

**لەمێژە**: لەمێژەوەیە: ڕوودا، ژمێژڤە، مێژڤە.

**لەمل**: لێپرسراوی، بەرپرسیاری.

**لەن**: دوورگە.

**لەناکاو**: لەپڕ.

**لەناوبەر**: لەنێوبەر.

**لەناوبردن**: لەنێوبردن.

**لەناوچوون**: لەنێوچوون.

**لەناوچوو**: لەنێوچوو.

**لەناودان**: لەنێوبران.

**لەناودەر**: لەنێودەر.

**لەنج**: هات و چۆی بەناز، ڕک لە دڵ.

**لەنجان**: لەش سووکی لەکاردا، پیاوی ئازاو زیرەک لەکاردا، دەڵەنجێ.

**لەنجە**: جوورە هەڵپەڕینێکە، لەنجەولار، لارولەنج، خەرامان، خەرام، ــ کردن.

**لەنجەولار**: لارولەنج، خەرامان.

**لەندەهۆر**: زڕ، زرتەبۆز، کەتە، قەلافەت، زەلام و ناڕێک، ترترە، (باک.) قۆلاتی، ناهەموار، زرەدێو، زەبەلاح، زەها، زها، زرەمێر، لاهێر، مرۆڤێکی زۆر زل و ناقۆڵا.

**لەنگ**: شەل، (هەورا.) گڕ.

**لەنگان:** لەرین، شەلین.

**لەنگاندن:** بۆ جوولاندنی بڕبڕە و مرۆی زلیش بەکاردەبرێ، پیاوی شەل دەلەنگێ، شەلاندن، لەراندن، گوواره دەلەنگێ.

**لەنگە:** شەلە.

**لەنگەر:** ڕێز، لەنگەری خۆت ڕاگرە. لەنگەری گەمی و کەشتیان، قافیەی شیعر، لەنگەرگرتن: هاوسەنگ گرتن، لەنگەر هاوێشتن: لەنگەر ڕۆهێشتن. (هەر.) تەبەقی ئاژەلانە نێو سمیان بریندار دەبێ. بە لەنگەر ڕاوەستانی بالندان لە هەوا لەکاتی فڕیندا بە ڕاوەستانی دەلێن. (باک.) تەزاندن.

**لەنگەرگا:** لەنگەرجێ.

**لەنگێزە:** خوڕە بەباران. بارانێکە بە خوڕ بباری.

لەنگێزەی بەهارەکە هەڵساوە خاسە

یا فرمێسکی چاوی سووری بە خوڕ دارژاوەمە.

**لەنگی:** شەلی.

**لەنێو:** دە، دەنێو، لە، لەنێو، دوڕ، تۆولق، تووی، لەنێو پاکەتیدا: دەپاکەتیدا.

**لەنێوچوون:** تێچوون، تێداچوون، مردن، زیان کردن، ڕەنج چوون، فەوتان، لەناو بردن، ڕیپ بردنەوە، ئەچکیینی، (باک.) کەیین، تەفرو توونا بوون، توونا چوون، توونا و توون چوون، چوونە نەبوون، توون بە توون چوون، تووشی ڕووشەو گێچەلان هاتن.

**لەنێوچوو:** لەناوچوو.

**لەنێوبردن:** کوشتن، تووشی ڕووشەو گێچەلان کردن، تەفرو توونا کردن، نەبوود کردن، لەناوبردن، توون بە توون بردن، (باک.) ئەجکاندن، بردنە نەبوون، توونا و توون بردن، تێ چواندن.

**لەو:** لە ئەو، (هەورامی کۆن) ئەزیچ، (فە.) لەی. چونکە، (باک.) بە هۆی. (لو.) لێو.

**لەواسە:** بەری دەست، لەواسەی پێ: بەری پێ.

**لەواشە** (سن.): کولێرە لە شەکروشیرە. (هەورا.) قاپی پەل، لەنگەری. (باک.) نەرم، ملایم.

**لەوان:** قامیشی حەسیری ئەستوور.

**لەوانە** (کە.): لەوەڕێن.

**لەوە:** ڕەشە وولاغ، لەوان: گاوان.

**لەوەپاش:** لەمەوپاش.

**لەوەدووا:** لەوەو پاش.

**لەوەڕ:** چەڕا، چەڕە.

**لەوەڕگە:** لەوەڕگەی هاوینان. چەڕاگە، چەڕوگا. چیرەگەخارا.

**لەوەڕان:** چەڕان، چەڕیان، چەڕین، چڕان، چڕیان.

**لەوەڕاندن:** چڕاندن، چڕیاندن، (هەو.) چەڕاندن، چەڕیاندن، چەلاندن، ڕاچەلاندن: ڕاچڕاندن.

**لەوەڕێن:** لەوەڕان.

**لەوەڕیین:** لەوەڕان، چڕین، چەڕان، چەڕیان، چەڕین، چڕان، چڕیان.

**لەوەتی:** لەوەتی دووهۆ: لەوەتی دووێنێ.

**لەوەبەر:** لەوەپێش.

**لەوەر** (کە.): چونکوو.

**لەوەڕیی:** قابیلی لەوەڕ.

**لەوەن:** بارییک، ناسک، قەحپە.

**لەوەند:** لەوهەند، لەوهێند، ــ یش بوون: لەوهەندیش بوون.

**لەوتاو** (کە.): پیس کراو، چلکن کراو.

**لەوەندە:** جەهیدۆک، گیایەکی بۆنخۆشە.

**لەوەندیی** (سور.): (سۆر.) ئەنگووچک. (باک.) باریکی، نازکی.

**لەوتاندن** (باک.، کە.): بلەوتێنە: چلکن کردن، پیس کردن.

**لەوچەر:** لەوچە، کەسێکە قسەی بێ مەعنا و هەلیت و پەلیت بکات.

**لەوچە** (کۆ.): زۆربلێ. لەوچڕ، هەلەوەڕ، هەرزە، کەسێکە ووتەی بێ ماناو هەلیت و پەلیت بکات. دەم و لووتی وولاغ، لمبۆز، لە جنێودا بۆ مرۆیانیش بەکاردەبرێ. (کە.) سووجبەتچی، هەرزەگۆ، زۆرڕێژ. (هەورا.) لەواشەی وولاخانە. (باک.، ڕۆژ.، کە.) زۆر بلێی.

**لەوچەتی:** زۆر بلێ یی.

**لەوچەلەوچ:** قەوچەقەوچ (ئی کەرێ)، (خۆ.) لەوچیینی.

**لەوچک** (کە.): قەراخ، کەنار، لالێو.

**لەودە** (هەو.): لۆدەی کا، کادین.

**لەودەیی** (خۆ.): خانوییکە وەکو ٨ و ایە بۆ کا. لەقامیش دروست دەکرێ. لۆدەیی.

**لەوەر** (فە.): لەبەر.

**لەورا** (باک.): چونکوو، لەبەروەی.

**لەورە** (کە.): لەوێ.

**لەوزینە:** لەبزینە.

**لەوس:** دەم و لێوی مالاتان، دەم و لێوی ئەستوور. دەوری زار.

**لەولاوە** (کە.): لارلارە.

**لەوساوە:** لەو کاتەوە.

**لەولەب** (باک.): گۆچانی چکۆلە. ـ ی (باک.): وەکو عەسای چکۆلە.

**لەولەوە** (باک.): زۆربلێ.

**لەوێ:** لەئەوێ، لەورا.

**لەوما** (باک.): چونکوو، وەکوو، چەند.

**لەونەش** (باک.): نائەهل. ـ ی(باک.): نالەبار، نائەهلی.

**لەوێدا:** لەوێندەرێ.

**لەوێڕا:** لەوێوە.

**لەوێندرێ:** لەوێدا.

**لەه** (باک.): پارچە کوت لەت.

**لەهاز** (موک.، ش.): مەلغە.

**لەهاندن** (باک.): ئیستیلاکردن، زەوت کردن، مەشغوول کردن، ئیشغال کردن، داگیرکردن.

**لەهۆش خۆچوون:** بووڕانەوە.

**لەهیکرا** (هەورا.): لەنەکاو.

**لەهیی** (باک.): شێلاو.

**لەهییزتن** (باک.): لەهیستن، گەمەکردن.

**لەهیستن** (باک.): لە هییزتن، بلەهیسە، گەمەکردن.

**لەهیستۆک** (باک): گەمەیەکی چکۆڵەیە.

**لەی** (هەورا.): بەرپە، (فە.) لەو، لەم.

**لە یەک چوون**: وەک یەک چوون.

**لەیرە** (دەر.): ئێرە.

**لە یەک بەربوون**: تێک بەربوون.

**لە یەک بەردان**: تێک بەردان.

**لەیلاج** (موک.): قارەمانی قومار.

**لەیلاخ**: محالێکی زۆر گەورەیە لە سەر خاکی ئەردەلان. (جاف.) کوێستان.

**لەیلان**: بەردەتراویلکە، سەراو، لینوفەر، نیلوفەر.

**لەیلوپەڕ**: لولوپەڕ، گیایەکە گوڵی مۆرەو بۆنی خۆشە زۆر جوانە گەڵای گەورەو پانە.

**لەیلووک**: لەلووگ، لەلوک، لەیلووگ.

**لەییز** (باک.): گەمە، یاری، هەڵپەڕین، جۆلانەکردن، گەمەیانی کوردی ئەمانەن: بڕێ، جەرە، چرێ، دییک و مریشک، گوورلە، کەرکێ مەلا، لاوێ لێ، مۆمە، سێگاف، سۆراومەما، تەرش، تاوس، تووشتە.

**لەییزاندن** (باک.): گەمە پێ کردن. تلی دان. هەڤدو ــــ: یەکتر فریوادن، هەڵپەڕاندن.

**لەییزین**: هەڵپەڕین.

**لەییی** (باک.): گەمەکردن.

**لەییستۆک** (باک.): لەهیستۆک.

**لەیی** (باک.): لەهی.

**لب** (باک.): دان، دانە.

**لبا**: لەم، لنک، لەکن، لای.*

**لباد**: نمد، نەو، نەوە، نەوەد، (هەو.، هەورا.) تاتی، نەمل، نەمە، کا، کەچە، (زەن.) نماوە، (شار.) نەووگ، (ڕۆژ.) نەوو.

**لبادە** (کە.، باک.): عەبا یا شنیلی لباد، فەرشی زین.

**لبادۆک** (باک.): جوورە بەرگێکی لبادی ژنانە.

**لبنان**: لووبنان.

**لپان** (باک.): جووڵان، بزووتن.

**لپر** (دزە.): ناقوڵاّ.

**لچ** (کە.، جا.، دەر.، فە.، هەورا.، سن.): لەلای خەڵکی سلێمانی لێوی خوارەوەیە. لێو. (خۆ.، گەر.) وولاّخ و ئاژاڵی چلێس و نەوسن یا کە فێری خواردنی دەبێ. لێوی وولاّخ و ئاژاڵ و مرۆیە.

**لچان**: لێودرێژ.

**لچە** (کۆ.): دەمسوورە، (کۆ.) جۆرە ماسییەکە دەمی سوورە.

**لچ قەوی** (ڕۆژ.): لێوئەستوور.

**لچک**: لییفکە، لفکە، لەفکە، لچکی شەدەو پێچ.

**لچن**: لێوئەستوور.

**لخ** (سیوە.): لق، لک، (کە.، کۆ.) ئی دار و ئیدیکەیە.

**لخار**: ساختە، پارووی گەورە.

**لخاو**: لغاو، دزگیین.

**لخاوەڕکە**: لغاوەبرکە.

**لخوەبۆری** (باک.): دەمار سست.

**لر**: لیر.

**لڕ** (جاف.): هەناسە برکەی مرۆی پییر.

**لرین**: نەوسن.

**لرخە**: قرخە، خزە، خییزە، دەنگی لووت و گەروویە، قوورتە، هەناسەی هەرەدوایی وولاّخ و ئاژاڵانە لەکاتی کوژرانەوەدا.

**لرخەلرخ**: خرینگەخرینگ، خزەخز، خیزەخیز.

**لرخن**: قڵخن.

**لرز**: لوز. بادام.

**لرفە** (موک.): کڵپە، کرپە، هەڵ لووشین. (ڕۆژ.) خواردنی زۆر بە تاسووخ. ــ کردن. ــ ی ئاوێ: نێلە، گرپە.

**لرفەلرف**: کڵپەکڵپ، کرپەکرپ، ئاهەنگی ئاوری.

**لرف دان**: قووت دان بۆ وولاّخانە، هەڵ لووشین.

**لرگ** (کە.، ڕۆژ.): چەشنەگرتیەکی گۆشتیە لەپاش خوراندن پەیدا دەبێ. لییر.

**لرگاو** (ڕۆژ.): لییک، ئاوی دەم.

**لرمە** (جا.، کە.، ڕۆژ.): گرمە، دەنگی بەسام وەکونی ئاوری. گرپە، گرفە. دەنگی تێکەوتنی چتێکە بکەوێتە نێو بییرەوە. گرمەی تۆپی.

**لزگە**: جەدوەل، لییسە، پێشوێنی، لێست، لێستە. لزگەی موو: تیسک. لزگەی وانە: جەدوەلی وانە.

**لستن**: لێسانەوە.

**لستنەوە**: ئالاستن، ئالێستن، لێستنەوە، لێستن، هەڵ لێستن.

**لغاو**: گەم، گەمک.

**لغاوە**: لخاوە، ــ ی زاری. لەغاچە، (ڕەوا.) قەمووچکە، لەخاوە، (هەورا.) لەغاوە، سەرلێف، ــ ی کەوشی: لێڤاسۆلێ.

**لغاوەبرکە**: سبەینان لە خورینی ئاسنی ساردی پێوەنێ چەند جارێک چا دەبێتەوە.

**لغەلغ** (ڕەوا.): (هەو.) غلەغل، دەنگی ئاخافتنی کەسێکە کە زمانی لەبەر نەخۆشی بەڵغ گرتبێ.

**لف** (ڕۆژ.، فە.): هاوکار، هاوشان، وەکو.

**لفانە** (ڕۆژ.): دووانە، جمک.

**لفە**: دووانە.

**لفک** (موک.، هەو.، هەورا.، کە.): لەچکە، لەچەک، لچکی پێچی پیاوانە کە لە شانییەوە دێتە خوارێ.

**لفکه:** لووفک، (دزه. ، هەو. ) لییفکە، لییفکەی گەرماویّ، لییفە. (هەو. ) لکی شەدەو جامەدانییە کە بەر دەدرێتەوە.

**لفکەشامی:** کوودوولفکە.

**لف** (باک. ) : دان، دانە.

**لفا** (باک. ) : لوا، خوریی بەرخان، بەرگن.

**لفان** (باک. ، هەکا. ، زاخ. ) : جوولان. (باک. ) هەوسار، دەستەجڵەو.

**لفاندن** (باک. ، هەکا. ، زاخ. ) : جوولاندن، بلقیینە، جیّ بەجیّ کردن.

**لفای** (هەورا. ) : ڕژیشتن.

**لفک** (باک. ) : لوو، پارچە گۆشتێکی ڕەقە لەنێوانی پێست و گۆشتدا لەبەر نەخۆشی پەیدا دەبیّ.

**لفکۆک** (باک. ) : پەڵە.

**لف لفاندن** (باک. ، هەکا. ، زاخ. ) : جوولاندنەوە.

**لفلفیین** (ئامیّ. ) : جوولان، جوولانەوە.

**لفن** (باک. ) : سووالّەت.

**لفنج** (باک. ) : شۆرباوی سەبزیی.

**لفیبان** (باک. ) : لڤیین، جوولان.

**لفیینی** (باک. ) : جوولان.

**لق:** کەل، گولیف، لک، لخ، لاخ، (باک. ) چقل.

**لقوپۆ:** لق وپۆپ، چلوویل، لقوبۆ.

**لک** (هەورا. ) : گریّ، لق، کەل، (هەو. ) کەد، (باک. ) تا، چقل، گولییف، لکەداری چکۆڵە، چڤک.

**لکان** (بابا. ) : پێوەنووسان.

**لکاو:** پێوەنووساو.

**لکاندن** (بابا. ) : پێوەنووساندن.

**لکوماندن** (باک. ) : بەرخوردن، تێک هەڵەنگواندن، بلووکوومیینە.

**لکوميين** (باک. ) : بلووکوومیینە، تێک هەڵەنگووتن.

**لکیین:** پێوەنووسان.

**لگن** (هەو. ) : خشتی کاڵ.

**لم** (بابا. ، کە. ) : لیم.

**لمه** (هەورا. ) : زگ.

**لمبۆز:** لەمبوز، لەوچە، کەپییلەڤ، شرنە، پۆز، لیپپۆز، (هەو. ) لمووز، قەپۆز، دەم و لیّوی وولاّخ و ئاژالانە. ـــ ی بەرازی: دەم و قەپۆزی بەرازی.

**لمۆز:** لمبۆز.

**لمووز:** لمبۆز، موز: ـــ ی بەرازی.

**لنج** (سل. ) : (هەو. ) لیچ، لییچق، (موک. ) ناڕێک، نارەحەت، ناکۆک.

**لنجوو:** گریّ و گۆڵی ماست لەنێو ماستاوێدا کە باش نەگیرابێتەوە. گلۆت.

**لنگ:** کەس، چت، مالاّتێکە تاکی جووتێکی ساز بکات. ـــ ی گۆرەوی، فەرد، لیینگ، (باک. ) لاق، لوولاک. ـــ ی وی لە هات: پێی وی بۆ ئێمە قر بوو. سرکی تفەنگ: تفەنگ لەسەر لنگە. تاک، تا، دوولینگ گۆرەوی: جووتە گۆرەوییەک. لنگە، قاچ، دوولینگ. ـــ بار، دووتا.

**لنگدان:** تاودان، غاردان.

**لنگه:** تاکی چتێکییە کە جووت بیّ. (ڕۆژ. ) لنگە دەستاڕ. لنگەفرکە: لنگەفریّ، لیینگە. لنگەگۆرەوی: لنگێکی گۆرەوی، لنگە تەرازوو: تاکێکی تەرازوو، پەلە، (باک. ) گووهەر، لنگەکەوش: لنگێکی کەوش. لنگەگوارەو بۆ تاکی هەموو چتێکی جووت دەبیّ. هاوالّ، هاوسەر، لنگبار: تار، لابار، تابار، (باک. ) بەستەک.

**لنگەبار:** تا، (باد. ) بەندەک، (باک. ) بەستەک.

**لنگەفرتیّ:** لنگەفرکە.

**لنگەفرکە:** لنگەفریّ، لنگەفرتیّ.

**لنگەفریّ:** لنگەفرکە.

**لنگەوژوور:** لنگەوقووچ.

**لنگەوقووچ:** لنگەوژوور.

**لنگک** (باک. ) : پێی مووبیلیا و هی تر.

**لۆ:** لۆی پشتێند و شەدەی، تووێ: یەک، لۆیەتوویّ: دووتوویّ، چووکڵ: چوکووڵ، ٢لۆ: ٢چووکڵ، ٣ لۆ: ٣ چووکڵ. بۆ: دەچم بۆبازاڕیّ. (فە. ، لور. ، دەر. ) ئەرا. (ڕۆژ. ) بەی. گیایەکی سیّ جوورە. کەولۆ: ڕەنگ تەڵخە، زەردەلۆ: ڕەنگی زەردە، ڕەشەلۆ: بۆگەنە. (باک. ) کابرا، برا، فلان.

**لۆبیا:** لە کۆمەڵەی پاقلەمەنیە. لە پاقڵە بچووکترە.

**لۆپ** (باک. ) : فەرش لەخوری بەرز. کولەرک، گومرگ.

**لۆت** (باک. ) : لۆک.

**لۆته** (شا. ) : مێوژێکە بە چاکی ووشک نەبووبیّ لەنێوانی تریّ و مێوژی دابیّ. قرقیلە، هەنجیر یا مێوژێکە لەکاتی ووشک کردنەوەدا هێشتا تەڕایی تێدابیّ.

**لۆتره** (خۆ. ) : هەلاّتن بە گورگە لۆقە.

**لۆترەوان:** چەنەباز. ـــ ی: جوورە ئاخافتنێکە تیپی هەر ووشەیەی سەرە و بن دەکریّ بۆ ڕاز پەنهان کردن وەکوو: ناچم: چانم، نارۆم: ڕانۆم. بە قسەی بیّ تەرتیب و هەروابیش دەڵێن هەڵییت و پەڵییت.

**لۆتک** (باک. ) : ـــ لخوە خستن: هەڵبەزینەوە.

**لۆتکه:** قفە، قایەخ، بەلەمی چکۆڵە.

**لۆتکیین** (باک. ) : بلۆتکە، هەڵبەزینەوە، هەڵبەزین.

**لۆتی:** جحێڵی شۆخ و تەڕو دڵتەڕ، هەرزەکار، کەیفچی، (باک. ) ئەوباش، مەیموون هەڵپەڕێن.

**لۆتی زەلزەله:** (باک. ) چەمباز، ئەو کەسەیە لەسەر گوریس هەڵدەپەڕیّ.

**لۆچ:** بۆ؟ ، گرنج، بۆچ؟ ، (ڕۆژ. ) بەی، قوورمیپچاک، گرژ، ـــ ی ڕوو و جلک، گرژی. (ڕەوا. ) کوریشیک بۆبەرگییەو ڕوو، قەمیپچەک، ـــ بوون: چیپندار، چرچ.

**لۆچاوی:** گنجاوی، گرژ، کورژ، ـــ ی ڕوو: کۆرمیپچەک.

**لۆچدار:** چیندار، گرژ، چرچ، لۆچ کردن، چین دان، چەرمکاندن.

**لۆچی:** چیپندار، گرژ، چرچ، لۆچ کردن: چینی دان، چەرمکاندن. ـــ ی: چیپنداری.

**لۆچ لۆچ:** زۆر بە لۆچ، چین چین، زۆر لۆچدار، گرنج گرنج، لۆچ لۆچ کردن: چین چین کردن، بۆ ڕوخسار.

**لۆچی:** چەرا، بۆچی، لەبەرچی، (ڕۆژ.) بەی، (هەورا.) پچی.

**لۆخ** (باک.): جلێیتاو، بەفر لە توانەوەدا.

**لۆخا** (هەورا.): مرازیی تەرەب و خۆشییە.

**لۆخانە** (دزه.): بەزم و شایی و ئاهەنگ. هەزار لۆخانە بەشێکە لە مەعیدەی مالاّتی کاوێژکار کە دوای ئەوەی خواردنی دووبارە کاوێژ کردەوە و قووتیدا دەچێتە ناوی.

**لۆخەلۆخ** (مەر.): لۆغەلۆغ، قرخەقرخ، گەرووگیيران، دەردێکە زمان دەئاوسێنێ دوایە دەبێتە هەوا و کێم کە دەربوو ئاسوودە دەبێ.

**لۆدە:** کای سواخدراو، کۆخ، کادان، (هەو.) لەودە، تەنباری کایە، کادین.

**لۆدک** (باک.): هەڵبەزیینەوە، لۆدک لخوە ئێخستن: هەڵبەزیین.

**لۆر** (هەو، هەورا.): لۆرک، لۆر.

**لۆراندن** (باک.): لالایی کردن، لاواندنەوە و ئارام کردن.

**لۆرە:** جوورە گۆرانییەکە.

**لۆرەپ** (کە.): لۆلەپی مەشکەیە.

**لۆرتە:** ترێی گەیشتووە.

**لۆرخ** (باک.): لیبلاش.

**لۆرک:** لور، لۆر، لۆلک، لۆرو جوور.

**لۆرو جوور** (کە.، ڕۆژ.): لۆرک.

**لۆریی** (باک.): کەسێکە لانکی ڕاژێنێ، جوورە گۆرانییەکە.

**لۆرین** (باک.): لۆراندن، لالایی کردن.

**لۆژەلۆژ** (کە.، ڕۆژ.): کەسێکە زۆر بێ هێزو بێ تینانە بڕوا.

**لۆس** (شا.): بەژنی ئەسپیندارییە ئی لای ئەستوارێی و درێژەکەیە کە بۆ کاریتە دەست بدات. (کە.) بێزار، وەڕەز، لۆس بوون، لۆس کردن.

**لۆس بەلۆس** (ڕۆژ.): کارەکە تێکچوو و شێوا، بزنێکە گوێی درێژبێ.

**لۆش** (باک.): نانی گەورە بە بێ هەویرترش.

**لۆشک** (باک.): کولێرەی بە بێ هەویرترش.

**لۆغان** (باد.): جیبقنە سپیلکە، زۆر بێ پیزو بێ هێزیی لەڕۆیشتندا.

**لۆغەلۆغ:** لۆخەلۆخ، لرخەلرخ، دەردێکە زمانی هەڵداسینێ لە دوایەدا لە لایەکەوە هەوای دەکا، کە دەربوو دەحەسێتەوە.

**لۆغین** (باک.): گیایەکە.

**لۆفە:** گەورە.

**لۆفک** (باک.): لۆبیای ووشک، لۆبیا.

**لۆق:** شەقاو، هەنگاو، لاق، ـــ درێژ: لاق درێژ، لۆقن.

**لۆقاندن** (باک.): لۆکاندن، غاردان، ڕەتاندنی وولاّخ.

**لۆقە:** هەولّ، ـــ کردن.

**لۆقەلۆق:** لۆژەلۆژ، قوّرتە ڕۆیشتن، بە قوّرتەقوّرت، هۆرتەهۆرت، بە قوونەقوون ڕۆیشتن، لەقەلەق، هۆڵتەهۆڵت. شینەمزەلام.

**لۆق لۆقین** (باد.): شینە سەرکاڵ.

**لۆقمە قادی** (باک.): شیرنیاتێکە لە ئارد و هێلکەو دۆشاوو هێلکە.

**لۆقن:** شەقاودرێژ، لۆق درێژ.

**لۆقین** (باک.): بە لۆقەلۆق ڕۆیشتن (بلۆقە).

**لۆک** (باک.): لۆپ، ووشتری نێر، گوومرگ، حەروازهەوانی، هەڵبەزهەڵبەز، بلۆک چوون: هەڵبەزیین.

**لۆکان:** قەلاّتێکە لەکاتی پادشایەتی میرمحەمەد پاشای گەورەی سۆراندا دروست کراوە.

**لۆکاندن** (کە.): لۆقاندن، غاردان بە لۆقەلۆق.

**لۆکە:** پەمبوو، (باک.) پرتی، (دەر.، باک.) پەمبوو، (دەر.) پەمۆ، (ڕۆژ.، هەورا.) پەمە، (باک.) پەمبە، لۆکەیی.

**لۆلەپ:** ـــ ی مەشکە: لولب، دارێکە هەردووک سەری خڕە دەهەنگڵەکانی مەشکەی دەخرێن.

**لۆلک** (باک.): لۆرک، پەپوولە.

**لۆلکەز:** پەڵوولّە.

**لۆلۆ** (شکا.، نە.، هـ.): بۆ بانگ کردنی نێرینانی بەکاردەبەن. (موک.) بەو کوردانە دەڵێن کە بە زاراوەی باکووری داخوون. ژێ بابۆ، ژێ.

**لۆنک:** پیست. فۆتە.

**لۆو** (باک.): لۆبیا.

**لۆوک** (باک.): لۆبیا، لۆبیای ووشک.

**لوێل:** ساوەڵ.

**لوو:** گۆشتپارەیەکی خڕە یا هێلکەییە لە بن پێستی لەشی مرۆڤی پەیدا دەبێ. تشپۆ، (ڕەوا.) تشپۆک، (کە.) لوی، (هەو.) سۆ، پەرزک، (باک.) لڤک. ـــ ی پێوەدووگی: کرک.

**لووا** (هەو.): بەرگن، (ژا.) تووکی بەرخانە.

**لووار** (فە.): کومبار، جوورە حەسیرێکە.

**لووان** (هەورا.، کە.): ڕۆیشتن، کۆکی، ڕێک کەوتن، لووای.

**لووای** (هەورا.): لووان، (فە.) چیینی، چوون، سازان، ڕێک کەوتن، ڕۆیشتن. لووە: بڕۆ، بچۆ. (فە.) لووای بەرە: چوونە دەرەوە، وەدەرکەوتن.

**لووبییک** (باد.): لووبیا.

**لووبیا:** لۆرک. لووبیای ووشک: لۆڤک، لۆوک.

**لووت:** پت، لویت، کەپۆ، کەپ، دفن، بێڤل، بێفل.

**لووتەلا:** لالووت، عاجزو سل.

**لووتەلایی:** ڕوونەدانە یەکێک. لالووتی.

**لووتەوانە** (هەورا.): خەزێم.

**لووتبڕاو:** کەپوبڕاو.

**لووت بلّند:** بەفیز، بەدەعیە.

**لووتپژان:** کەپوو دارسان، بەربوونی خوێنی لووت، لووت هاتنە خوار.

**لووتخووار:** لالووت.

**لووتکە:** پڕۆم، (شار.) بلۆسک، (کۆ.) کەپک، (هەورا.) لووتەی شاخ، تەپەڵۆکی شاخی، بازگە، قووتکە، قیتکە، بەراز، (گۆ.) تەڤینگ.

**لووت هاتنەخوار:** لووت ڕژان.

**لووخانە** (کە.): بەزم، ناهەنگ.

**لووجاندن** (باک.): کلک جوولاندن، بلیجیینە.

**لووچیین** (باک.): کلک جوولان (بلوورچە).

**لوخت** (فە.): ڕووت.

**لوور** (ڕەوا.): پندربوونی زوبان و زارەدرای چێژتنی زاخییە.

**لوڕ:** هۆزێکی گەورەیە، دوو بەشە: لوڕی گچکەو لوڕی گەورە ئەوانە هەمووی چوار لکن: لوڕ، لەک، شوان، بەختیاری.

**لووچکاندن** (باک.): بەرگ داکەندن، پێستی تەنک لێ کردنەوە. بلووچکیینە.

**لووچکیین** (باک.): پاک کردن، تیکوول لێ کرانەوە.

**لووراندن:** لووڕین، کووزین، زووڕین، بۆ سەگ و گورگ بەکاردەبرێ، لورلاندن، لیراندن، لیرین.

**لوورە:** ـــ ی سەگی و گورگی، لووڕین: جێگا، (دەر.) لوولە. (کە.) جوورە کورتانێکە.

**لوورەلوور:** نێوی دەنگی سەگی و گورگی و چەقەڵییە کە دەلوورێنێ، (دەر.) لوولەلوول.

**لووڕی:** جوورە کورتانێکە، کورتانۆکەی دووفلیقانە.

**لوڕستان:** (فە.) لوڕسۆ.

**لوڕسۆ** (فە.): لوڕستان.

**لووڕک** (هەو.، کۆ.): ژاڵە.

**لووڕین:** لووران.

**لووزەو** (شار.): ڕێژنە، (موک.) ڕێژەو، بەلێشاو هاتنەخوارەوەی ئاو لە گۆزە ویا دەغڵ لە کەندوو و ئیدیی.

**لووس:** منداڵی ـــ : منداڵی بێ تووک. لووس بوون، لووس کردن: فەرتاندن، شاییک، شاهییک. (باک.) حوولی، هلوو، هلووس، هییت، پووس، تاس ولووس، لووس وپووس، شووت. تەواو، هەموو، ـــ کردن: شاهین کردن، شلالە: شابیک کردن.

**لووساوک:** سوولاوک، پلووسک.

**لووساوکە بەستن:** ـــ ی خووێن: خووێن بە جۆگە هاتنەخوارێ.

**لووسکە:** نێرییینەی حیز، ـــ بازی: نێربازی.

**لووس و پووس:** تاس و لووس.

**لووش** (باد.): کولێرە.

**لووشاندن:** هەڵ لووشینی بە کەپۆ.

**لووشە:** (ڕەوا.، خۆ.) لیشمە. (باد.) لووشک. چڵە گیایەکە وەکوو سێ پەلکە وایە لە بنەوە وە پیوازی دەچێ مەیلەو سوورە نێرێکی ئەژنۆیێک بڵندەو لەسەرییەوە ٥٠ ـــ ٦٠ گوڵێکی گچکەی وورد وەکوو دەسکەگوڵی دەردەکات، سوورێکی سپی پاتە لە دژکولێیی دەکەن. (کە.) گریان.

**لووشەلووش:** وولاغ کە جۆی بییینی ـــ ی دەکات، (دەر.) حرمەحرم، فووشەفووش. لووشەی کەر و ئەسپ و ماین، خرماندن. فیشکەفیشک: گریان، فووشەفووش.

**لووشدان:** ـــ بە دوویێیان: جووتە، جفتە.

**لووشکە:** جیفرکە، لەقە، لووشکەناوێژتن: جووتە ئاوێژتن. لووشکە لێدان: لەقە لێ دان.

**لووشکەلووشک:** حرمەحرم.

**لووشیین:** هەڵ لووشین.

**لووغمە** (موک.): قایشێکی درێژە لە زییندا ئاوزەنگی پێوەکراوە، زەخمە.

**لووفک** (باک.): لفکە.

**لووگی:** خووێری، (ڕۆژ.) خۆر، بەدەستی بەتاڵگەڕ.

**لوول** (باک.): حەیزەران، خیزەران.

**لوولاک:** (باد.) دورپشی، ئێسکی بەڵەکییە، مووچە، (ڕەوا.) سپیلکی پێ.

**لوولاق:** پیپر، (باد.) چۆقڵ.

**لوولاندن** (کە.): لووراندن.

**لوولە:** ـــ گۆزە و نیتر، ـــ ی تافتەو نیتر، ملوانەیەکە بەسەر سنگدا شۆڕبێتەوە و بگاتە سەر هەیاسە، (باک.) بەریانگ، ـــ ی ئاسن: تیبرک، ـــ ی تفەنگی هەرچی بێ، باڵۆڵ، (باک.) بۆرییک، بۆریی، کووربۆڕی، گێسین، داریی زۆر ئەستوورە دەکرێتە تەختە، (هەورا.) باهور، ـــ ی خاوێن کردنەوە: مرازێکە لە کەرەستەی جۆلایی. لوولەکردن: خەفیزۆک، ـــ ی دار: (باک.) بۆت، ـــ ی چکۆڵە: دارۆیی، لوورە.

**لوولەلوول** (دەر.): لوورەلوور.

**لوولەپەر** (باک.): شەپۆلدار، زینەتدار.

**لوولەجەگەن:** جوورە جەگەنێکە بێ گرێ و گۆڵ و لووس هەڵدەچێ و لەسەرەوە گوڵێکی دەردەکات، نێوی پووکە (پووچە) بۆ کورتان و ئالاشی خانوان دەست دەدا و پێش بەندانیشی پێ دەگرن.

**لوولەلوول** (کە.): لوورەلوور.

**لووله هێن:** مەسینە، ئافتاوە.

**لوولەیی:** وەکوو لوولە.

**لوولدان:** تێکەوەپێچان، وەرپێچان، (باک.) تاپان، پێچانەوە. (باک.) یەکێکە لە مرازی کەرەستەی تەونی، (دەر.) لوولکە، پەلوو (چێشتێکە).

**لوولک** (باک.): لوولەی گۆزە یا کووپە، (کۆ.) لەیلووک، لەلووک، پنجە گیایەکە گەڵای پانە بەڵاڵ وەپیوازی دەچێ.

**لوولکە** (خۆ.): جوورە دێمکەیەکی ئاوییە قامیشێکی تێ خراوە. (کۆ.) لوولوو، نی جۆڵایانە.

**لوولوو** (بابا.): (کۆ.) لوولکە، نی جۆلایانە.

**لوولووپەڕ:** گیاییکە لە ئاوی ڕاوەستاودا دەڕوێ بنی وەکوو گێزەرییە لاسکی لووسە بڵند هەڵدەچێ کە گەیشتە ئاستی سەر ئاوەکە گەڵا و گوڵ دەردەکات. لەیلووپەڕ، نیلووفەر.

**لوولی** (هەورا.): بلوێر لێدان. ـــ ژەن: بلوورلێدەر.

**لوولێنە:** گزسکە.

**لوونگ** (زەن.، کەل.): فۆتەی گەرماوێیە.

**لووێچ:** پڕ بە دەستێکی درێژووکە کراوە. لاویچ، (باک.) جەلک.

**لوێنه** (زەن.): ناشەوان.

**لوویی** (کە.): لوو.

**لووییت** (کە.): لووت، کەپۆ.

**لووێته** (فە.): ڕووت.

**لویس** (کە.): لووس.

**لویشکە** (کە.): فیشکەفیشکی وولاَخە کە داوای ئالیکی بکات.

**لویشکاندن** (کە.): لووشەلووش.

**لها:** نێره.

**لهفە** (باک.): جووره پێچپێچکه، مێزەر.

**لهۆن** (هەورا.): پارچە خاکێکە لە هەوراماں کە بەشێکی کەوتۆتە عیراق و ئەویدی کەوتۆتە ئێرانەوە.

**لێ:** لە ئەو: لێیم وەرنەگرت: لە ئەوم وەرنەگرت. لێ وەرگرتن: لە ئەو وەرگرتن، لێ دروان: لە ئەو دروان، لێ دان: لە ئەودان. ئەوێ کەسی لێ نەبوو. ـــ بورر: بەخشەر، چاوپۆش، ـــ بووردن: بەخشین، چاوپۆشی. چونکە. (باک.) ئۆخ، بەلاَن، بۆیە، چونکو. لەکاتی قسەکردنی لەگەلّ ژنان بەکاردەبرێ.

**لیانی** (هەورا.): هێلانە.

**لیان:** جوولاَن.

**لێ بەربوون:** تر، تس کەندن. دەست لێ بەربوون، کۆتایی بە کاردان.

**لێ بەشکراو:** بەسەردا بەشکراو.

**لێ بەش کردن:** بەسەردا بەشکردن.

**لێ بڕان:** ئارەزوو، خەبات، حەزکردن. کورتی هێنان، کەم وکورتی تێ کەوتن.

**لێ بڕاوبوون:** خەریک بوون، بڕیاردان، خۆش بوون.

**لێ بردن:** تێراکردن، تێرۆکردن.

**لێ بووەوە:** پەڕیو.

**لێ بووڕەر:** بەخشەر، چاوپۆشی کەر.

**لێ بوردن:** بەخشین، چاوپۆشی، خۆکردنە قوربانی، وازلێ هێنان.

**لێ بووردوو:** لە خۆ خۆشبوو، فیدایی.

**لێ بوورین:** بەخشین، لێ بووردن، چناویەرد، لێ وەڕوونەهێنان، بوورین، بەسەر چوون، وەڕوونەدانەوە.

**لێ بوون:** لێوەبوون، وەبوون.

**لێ بوونەوە:** لێک بوونەوە، جوێ بوونەوە، پەڕاندراو، لێ فڕێدراو. تەواو بوون، تەواوکردن، لە کار بوونەوە، کۆتایی بەکاردان. گەلاَ لە داربوونەوە، لێک جوایز بوونەوە.

**لێپ:** فێلّ، فریو، (باک.) فەرەج.

**لێ پرس:** پرسیارکەر. لێ پرسراو، بەرپرسیار. پرسکەر، پرسیار.

**لێ پرسراوی:** بەرپرسیاری.

**لێ پرسین:** پرسیار لێ کردن.

**لێ پیس کردن:** نەخۆشییەک، کە تەشنە بکات و چاک نەبێتەوە.

**لێپۆک** (باک.): قەشمەر جاڕ، شایانی قەشمەری. (باک.) ـــ ی: قەشمەر جاڕی.

**لێ پێچانەوە:** سۆراغ کردن و پرسیارکردنی چتێک.

**لێیوو** (فە.): لێوار، کەناری ئاو.

**لێ تێک چوون:** بەسەرچوون.

**لێچ** (باک.): لیچ.

**لێچەک** (هەورا.): لەکی پێچی سەری یا چتێکی لە گەردن ئالاَندن.

**لێچوو:** موشەبەبەه (ڕەوانبێژی).

**لێ چوواندن:** وێ چوون، تەشبیهکردن، وێچواندن.

**لێچوون:** دەلاَندن (بۆ ئاو)، ڕەنگ و چڵک لەبەر ڕۆیشتن. (کە.) وێچوون.

**لێخەفتان:** بە تەنگەوە بوون، هەوڵدان. لێ نەخەفتان: سەرسەرەکی.

**لێخراو:** لە کار دەرکراو.

**لێخرێنەوە** (باد.): شەمچە.

**لێ خستن:** لێ خشاندن، (باک) کوتان، لێدان (لێخە).

**لێ خشان:** لێ خران.

**لێ خشاندن:** لێ خستن.

**لێخن:** شلوێ، شێلوو.

**لێ خۆشبوون:** لێ بووردن.

**لێدان ڕۆیشتن:** سەری خۆ هەڵگرتن و ڕۆیشتن.

**لێخوران:** ئاژووان، ڕانران.

**لێخورە:** بازۆ، بڕان.

**لێخورین:** ئاژۆتن، ڕادان، ڕاناندن. (دەر.) ڕانان.

**لێدان:** هەرشاندن، هەرستاندن، (هەورا.) مەژەند. چت بە دزی شاردنەوە.

**لێ دراو:** کوتراو. (باک.) هیلە.

**لێ دەرکردن:** تەرح (ژمارە).

**لێ دان:** (دەر.) بالەی، کوتەکدان، تەپ کرن، (باک.) تەپساندن، ژەناندن، ساتن، گەش، شاناندن، شۆپ.

**لێ دوو:** چەرپاندن.

**لێ دووان:** شەن و کەوکردن، تەنقیدکردن، تەوس لێ دان. لێ ڤەکۆلان.

**لێڕ:** لێڕەوار، جەنگەل، جەنگەلستان، دارستان، بێشەلاَن.

**لێر** (فە.): لیبیک، ئاوی زار.

**لێرە:** (باک.) ئێرەهە، لەئێرە، لوێرە. لێرەیە: لەئێرەیە.

**لێزان:** زانا.

**لێ زانین:** زانین.

**لێزم** (باک.): خزم.

**لێزماو:** سەیل.

**لێزمە** (هەورا.، شا.، زەن.): خوڕەمە باران، ڕێژنە.

**لێزمتر** (باک.): خزمی دوور.

**لێزمتی** (باک.): خزمایەتی.

**لێزین** (باش.): گەپ، گەمە، یاری.

**لیـــژ:** نشـێو، جێگــای ســەرەوژێر، ســەربەرەوخوار. ـــ مەو بـــوون: سەرەوژێربوون.

**لیژاو:** ئاوێک، کە لە شوێنێکی بەرز لێژ بێتەوە خوارێ.

**لیژایی:** نشێو.

**لیژەلیژ:** کۆمەڵەداری لەسەر یەکتری دانراوە.

**لیژنە:** دەستەیەکە لە چەند کەسێک پێک دەهێنرێ بۆ لێکۆڵینەوە و بڕیار دان لەسەر کارێک.

**لیسان:** لستن.

**لیسانەوە:** لستنەوە.

**لیسە:** جۆی سووێرو برژاوە لـە جیاتی خووێ دەدرێ بـە مالاّتـان. مالّـە، ماسنج.

**لیستە:** لزگە.

**لیستن:** لیّسان، لیّسی، لستنەوە.

**لیسکە:** مرازێکە ناوی کەوچکی داری پێ لـووس دەکرێـت لـەدووای قـووڵ کرانی لەباتی ڕەندەی.

**لیستنەوە:** لیّسانەوە، لیّسینەوە.

**لیشاو:** لافاو، سیلاو.

**لیف:** داری خورما تووێکڵێکی سووری تـەنک فـڕێ دەدا خـەڵک بـەکاری دێنێ بۆ شووشتنی قاپ و قاچاغ لیبیفی پێ دەڵێن. لیّف.

**لیفە:** لیفەمشر، لیبیف، مێشرەف، تۆبەر (ئی سەرەوەیە) (باک.)، تۆپەری (ئی چکۆڵەیە).

**لیڤ** (باک.): لیّو، کەنار، لیڤاناڤی: کەنارئاو، لیڤـاچیێ: کـەناروبن چیا، لیڤاسۆلی: لغاوی کەوشی. سەرلیّڤ کرن: بەسەری لیّوان ئاخەفتن.

**لیڤۆک** (باک.): لیّپۆک، قەشمەرجاڕ.

**لێ قـەوماو:** بەدبـەخت، خاکسـار، خـەمناک، چـارەڕەش، بەسـەزمان، بەستەزمان. هەژار، بێچار. تێماو، ناچار.

**لێک:** لە یەک، لـەیێک، لێک دابڕان: لە یەک هەڵبڕان. لێـک بـوون: لـە یەکتری زیزبوون.

**لێک بوون:** لێک جووێ بوونەوە.

**لێک بوونەوە:** جووێ بوونەوە، دووپارچە بوون.

**لێک بڕان:** لێک دابڕان، لێک جودا بوونەوە.

**لێک لادان:** خۆ تەریک کردنی دوو کەس بۆ ئەوەی بەرەو ڕووی یەک نەبن.

**لێک کردن:** لـەیـەکتری جوداو زیزکردن، دوو خۆشەویست لـێـک جووێ کردنەوە، بێ بەش کردن، بەری کردن، وێک چوون.

**لێک کردنـەوە:** لـەیـەکتری جووێ کردنـەوە، دووکەسی شـەڕکەر لـێـک جووێ کردنەوە، جووێ کردنەوە.

**لێک پەترکردن:** مزایەدە. زیادکردنی نرخ.

**لێک نێخستن** (باد.): بەشەڕدان.

**لێکدابڕان:** لێک بوون، هەڵبڕان، دوور کەوتنەوە.

**لێکدالێک:** یەک لەسەر یەک.

**لێکدان:** د بەر هەڤدان، دوو یا چەند کەسێک لە یەکتری بدەن.

**لێکدانـەوە:** فەلـسـەفە، بـەراوردکردن، لـێ ووردبوونـەوە، ـــ ی دەنـگ و باس. ڕاڤە کردن.

**لێک کراو:** بەشخوراو، بەشبڕاو، بێ بەش، هەڵبڕاو.

**لێکەوتن:** عەزل بوون، هەژاربوون، وێکەوتن، لـە پایەو پاسایان بوون.

**لێ کەوتنەوە:** هەژاربوون.

**لێ کەوتوو:** هەژار.

**لێک خشان:** بە یەک کەوتنی ڕووکەشی دوو شت.

**لێک خزان:** لـە یەک هەڵبڕان.

**لێکچوون:** بە یەک چوون.

**لێکچوو:** بە یەک چوو.

**لێک خستن:** لێکدانی دوو چت.

**لێک دوور کەوتنەوە:** لێک هەڵبڕان.

**لێکەوت:** شایان، لێوەشاوە.

**لێک فەکرن:** لێک کردنەوە، دابەشکردن.

**لێک کردن:** لە یەک کردن. (بابا.) وێکچوون.

**لێکراوەوە:** پەڕاو، پەڕاندراو.

**لێک کەوتن:** بە یەک کەوتن.

**لێک کراو:** بەشخوراو، بێ بەش، بەش بڕاو.

**لێ کـردن:** بـارکردن، بـێ بـەش کردن، عـاجزکردن، دەغـڵ لـە ئـاش کـردن، هاڕین، لە ئاو کردن: نەهێشتنی ئاو بخواتەوە. وێچوون، پێچوون.

**لێ کردنەوە:** پەڕاندن، پچڕین، پچڕاندن، لێ فڕێدان. ـــ ی گوڵ و میوە: چنین، چنینەوە.

**لێک نران:** قوچان، چوقان.

**لێک نان:** قوچاندن، تررووکاندن، داخستن، چوقاندن.

**لێک هەڵبڕان:** ترازان.

**لێک هەڵبڕین:** ترازاندن.

**لێک هەڵوەشان:** لـەبەر یەک چوون.

**لێکۆڵینـــەوە:** وێ کــەوتن، لـێ قــەکۆڵان، ژۆر و ژێـر ئـانین، لـەبنچینــە دەرهێنان.

**لێ گـەڕان:** وازلـێ هێنـان، بـەردان، بـەرەڵاو ئـازاد کـردن، بـەلاوەنان. وە شوێن کەوتن، لـەدوو گـەڕان، وە دوو کـەوتن، لـێ گـەڕیان، لـپەی گـەڕیان، پێرەگەڕیان.

**لێ گەڕاو:** وازلـێ هێنراو.

**لێ گرتن:** ڕەخنە گرتن، بـەژاڤیت، عـەیب لـێ دۆزینـەوە، هـەڵبژاردن، لـێ ژمارکردن، لێم مەگرە: بە عەیبی مەزانە لە من.

**لێ گرتنەوە:** تەنینەوە، لـێ بڕین.

**لێ گۆڕان:** گومڕابوون.

**لیل:** تێکڵ، شلوێ، شێلوو، لیّل بوونی هەوا، لیخن.

**لیل بوون:** شێلووبوون.

**لیلات** (باک.): پان، تەراز.

**لیلاف** (باک.): شلێوە، باران و بەفر بە تێکەڵاوی هاتن.

**لێلاو** (هەورا.): شلوێ. ـــ ی: ئاڵۆزی و شێوانی چاو.

**لێلایی**: کوێرایی، (لێلاییم گاتێ).

**لێڵ** (جا.): لەگەڵ.

**لێ لێ** (شکا.، جز.، نەهـ.): کەسانی مێیینـەی پێ بـانـگ دەکرێ، جوورە گۆرانییەکە.

**لێم**: لەمن.

**لێمان**: لەئێمـە. خوواردنێکـە هـەزم نـەکرێ و ببێتـە هـۆی نەخۆشی دەڵێـن لێمانیتی.

**لێمشت** (باک.، سۆ.، هەو.): لافاو وسێلاوی قوڕاوی.

**لیمۆ**: لیـیمۆ.

**لێنان**: ئامادەکردنی چێشت.

**لێنیی** (باد.): لێنراو، چێشت.

**لێنگیز** (ڕەوا.): چۆڕاوگەی ئاوێیە، ئاو لەبەر هەر چتێکی بڕوا. (شا.) تۆفان، سێلاو، بارانێکی بە خوڕەم بباریێ، هەستانی ئاوە.

**لێو**: لیف، لچ، لەواسە، لەو، بە ژێر ـــ کردن: شـاردنەوە. قـەراخ، کـەنار، لێوار، (هەورا.) دەلق: چتێکە وەکوو (خەرقـە) وایـە. لێـو ئەسـتوور: لـچ قەوی.

**لێوە** (قوتبەیی، ڕۆژ.، کە.، فە.): فرۆی شل، شیری ژەک بـەکوڵاوی، کـە شل بێ لێوەیە، کەتوند بێ کەرەیە. شێتی، فێ، لێودار، لێوپاک: فێدار.

**لێوەبوون**: لـێ بوونەوە، تەواو بوون، لێک جووێ بوونەوە.

**لێوار**: قەیار، کەنار، قەراخ، ڕۆخ، دەماوەڵ، ڕووخ.

**لێوان**: پەرداخی ئاو.

**لێوەخۆ کەوتن**: خۆ بۆ ئامادە کردن.

**لێوەرگرتن**: شت لـە یەکێ وەرگرتن.

**لێوەستان**: تەماشا کردن.

**لێ وورد بوونەوە**: بەراورد کردن، سەرنج دان.

**لێوڕێژ**: لەسەر ڕژانەوە، ـــ بوون: ترهان، ـــ کردن: ترهاندن.

**لێوستان** (دەر.): نۆڕیین، تەماشاکردن.

**لێوەشان**: لێهاتن، لایەق بوون.

**لێوەشانەوە**: بەژمێر، توانا، لێهاتن، ژێ هاتن.

**لێوەشاندن**: لایەق پێ دیتن.

**لێوەشاو**: لێهاتوو.

**لێوەلەرە**: لێـوە لـەرزە لـە سەرمان یا لـەبەر گریان.

**لێو ئەستوور**: لچ قەوی، لچن.

**لێوەلەرزە**: لێوەلـەرە.

**لێ هاتن**: لـێ هەلاتن، گان کردنی مـالات و وولاخانـە، لـێ وەشانەوە، ژێ هـاتن، (هـەورا.) دومبەڵێکـە لـەنێو زگـدا پـەیدا دەبـێ ئەگـەر تـا ٢٤ کەژمێران نەیکوژێ پێ نامرێ.

**لێ هاتوو**: لێوەشاوە.

**لێ هەلاتن**: لـێ هاتن (گان کردنی مالات و وولاخ)، لەدەست فیرار کردن، ئەستێرەی بەخت درەوشانەوە.

**لێ هەڵسوون**: تێ هەڵسـوون، سووین.

**لێ هەڵگەڕانەوە**: بادانەوە، پەشیمان بوونەوە.

**لێ هەڵگەڕاندنەوە**: پێ بادانەوە، پەشیمان کردنەوە.

**لیبان** (هەورا.): کونێکـە لـە دیـیواریدا لـە زستاندا میـوەی تێـدا هـەڵدەگرن و زاری دەگرنەوە، بۆ هەموو جێگایەکی ئەو تۆ بەکاردەبرێ کە میـوەی تێـدا بشاردرێتەوە.

**لیباو**: شەپۆل.

**لیپ**: لزگە، سێ ـــ: سێ لیزگە.

**لیپان**: پڕبوون.

**لیپاولیپ**: پڕاوپڕ.

**لیپۆر** (کە.): لمبۆزی بەراز.

**لیپۆک**: قەشمەرجاڕ.

**لییت** (هەورا.، فە.): لووت، کەپۆ، پت.

**لییتاف** (باک.): لیتاو.

**لییتاو**: (باک.) لییتاف، لییتە، قوڕاوێکی شلە.

**لییتە**: قوڕێکی زۆر شلە، لییتاو، بێرم.

**لییتۆکە** (باک.): پیس، ناپاک.

**لییچ** (هەو.): لیـیچق، چتێکە شل وگربێ.

**لییچاڵ**: مورەببا.

**لییچق**: چتێکی شلە بەدەست و ئیدیکەوە دەزوولـە بکـات و بیگری. لنج، (هەو.) لیچ، لییچ، لیینج، (کۆ.) لیینچق، (هەورا.) لینجاو.

**لییر**: کەمۆرانە بە لـەشی مرۆیـدا هەڵگـەڕێ یـا بیگـەزێ قنچکـەیەکی لـە لـەشـی مـرۆی پـەیدا دەبـێ دەرنـابێ و دەڕەوێتـەوە. (ژەن.) لـیر، (ڕۆژ.) لرگ.

**لییراندن** (باک.): لووراندنی گورگی و ئیدییە، بلوورینە.

**لییرین** (باک.): بلییرە، لووراندن.

**لییرە**: سکەی زێڕە، لیرا.

**لییزوان** (باک.): گەمەکەر.

**لییژنە** (شا.): گزرە، گیشەدار، تایەی دار.

**لییس** (بابا.): لیـیسی کوێری: شـەڕی کوێرانـە، داپڵۆسـین و لێکـدان. کۆترخـان، (بـاک.) ئـەنزێل. (کـە.، جـا.، مـەر.، بـاد.) کووتـەک، (کۆ.) مرخە، داردەستێکی ڕاستە کە هیچ سەرێکی خووار نەبێ. لیس لێدان: بە کووتەک لێدان. (باک.، هەو.، ڕەوا.) هێلانەی کۆترانە لـە بن گوێ سووانانی دروست دەکەن. (ڕۆژ.) جقە، هێلانـەی مریشـکانە لـەسەر دارو پووش و هەڵاشی دروست دەکەن جێگایەکە پێویستە بڵندبێ.

**لیساندن** (باک.): باڵندە دە هێلانەکردنەوە، بلیسیینە.

**لییسە**: لزگە.

**لییسک** (هەورا.): زەنگەتەی ترێ. (ژەن.) تیشک، ـــ ی خۆر.

**لییسۆکە** (شار.): بەردێکی پڕ بـە چنگییـە یا بـە قـەدەر هەنارێکییـە کـە لووس بێت.

**لییسهان** (باک.): هەڵنیشتنی باڵندانە لە هێلانەدا یا لـەسەر لکی داران.

**لیبشمە** (جا. ، خۆ. ): لووشە (گیا) ، خشت وخاڵ، چرپ وچاڵ.

**لیبغەڕوو** (فە. ): ڕیخۆڵە.

**لیبف** (دەر. ، باک. ، کە. ، ڕۆژ. ): لێفە، بژیی گیایانە، تیکوڵی دارە خورمایە کە سووک و تەنکە قاپ و قاچاخی پێ دەشۆرێ.

**لیبفە**: لفکە.

**لیبفک** (باد. ): کودرولیبفکە، کووکەلەی زەرد.

**لیبفکە** (هەورا. ): لفکەی خۆ پێ شوشتنێ. (باک. ) لیبفک. لفکەی پێچانیشە. (هەورا. ) لفکە.

**لیبفۆک**: لیبۆک، هەزەلی.

**لیبق** (بابا. ): لیبچق.

**لیبقە**: ـــ ی مەرەکەبی.

**لیبقەلیبق** (باد. ): قاقای پێکەنینی.

**لیبک**: بزاق، بۆراک، ئاقدم، ڕیینگاو، ئاوی زار، لیبگاو، (باک. ) چڵم، ئاوی کەپۆە.

**لیبکاو**: ئاقدم، لیبک.

**لێکردنەوە**: میوە لە دارکردنەوە. دوو یا چەند چتی پێکەوە نووساو لێک جووایەز کردنەوە.

**لیبکن**: لرگاو.

**لیبل** (باک. ): جوورە دووپشکێکە. پێستی داری، تیکووڵی داری. ـــ کردن: پاک کردن.

**لیبلاڤ** (باک. ): قوڕێکە تێکەڵ بە بەفری تووا وەوە بووبێ، لۆرخ.

**لیبلک** (باد. ): هەڵۆوک. (کۆ. ، باد. ) قایشی چیغییە.

**لیبلووپەر**: نیبلوفەر، بەنونی.

**لیبم** (موک. ، باک. ، سور. ، فە. ): قەوزەی ئاوی. دارێکە. لیمۆ، لیمۆن. نێوی ئافرەتانە.

**لیبمدار** (موک. ): (هەو. ) لیبودار. (باک. ) بسیلکەک.

**لیبمانە**: گرییمانە، بلّیمانە. ئەو تەڕاییەیە کە لەگەڵ کارو بەرخان دەبێ، تەڕایی کارو بەرخانە دووای بوونیان بۆ منداڵیش بەکاردەبرێ وەکوو چڵم وایە. میینای دەریایانە، یانی جێگای بە لیبم، جێگای لیبمدار، لیمدار.

**لیبمۆ**: ترنج، ترنجۆک، دارێکە بە بەرەکەشی هەر لیمۆ دەڵێن.

**لیبنە** (زێ. ، ئاک. ): کووپەی ئاوی.

**لیبنجاو**: لیبچق.

**لیبنج** (ڕۆژ. ): لیبچق، چەسپ وەکوو چەسپی چریش و ئیدی.

**لیبنجق** (کۆ. ): لیبچق.

**لیبنجی**: لنگ.

**لیبنگ**: لاق، لنگ. تاوەی چێشتی.

**لیبنگە**: لنگە.

**لیبنگەفرکە**: لنگەفرکە، لاق لە زەوییەوە وەژاندن، منداڵ لە زیزبوونیدا و مەرو بزن و ئیدیکە لە سەربڕینیدا.

**لیبنگدان**: غاردان، بەزین.

**لیبنی** (هەورا. ): ماڵی، کەوی، خانەکی.

**لیبو** (بابا. ): لیبمی وورد، خیزیی وورد، لم. ـــ دار: لیبمدار. بسیلاک.

**لیبوان** (باک. ): داڵان، هەیوان، پێشخان، لیوان.

**لیبوە** (زەن. ): شیپ، دیوانە.

**لیبویی** (هەورا. ): وەرگەڕاو، سەرەوژێر.

**لیی یان** (باک. ، شەم. ): کەوشی دارە لەسەر بەفریی پێوە دەڕۆن. ما. (فە. ) مێ.

**م**: تیپێکی ئابێی کوردییە. (باک. ، شکا. ) مەن (تەنها بۆ تێپەڕ بەکاردێ) ، م داتە: من دامە تۆ، م گرت: من گرتم. م کوت: مەن گوتم. م: ڕاناوی لکاوی: دەستم.

**ما** (دزە. ، خۆ. ، باک. ، بار. ، جا. ): چیا، ئایا. چما، ئەرێ؟، ما بڕوا چییە؟، بۆچی ئەگەر بڕوا چییە؟، ئەرێ ئەگەر بڕوا چییە؟، بۆچ، لۆچی؟، چی، ئەدی. مێ، کارەمایە: کارەمێیە. ئەدی، ما نایەوێ: خۆ نایەوێ. ما چ بکەم؟: ئەدی چ بکەم؟. غارو هۆلی مەراز. (پژ. ) بۆ، بۆچی، ما باکەی؟: بۆچی بانگ دەکەی؟.

**ماء**: بالاّندنی بەرخانە. ـــ کردن: بالاّندن.

**ماء ماء**: بالەبالی بەرخانە.

**ماپارە**: نێوی ئافرەتییە.

**مات** (موک. ): بەپەرۆش، پەرۆشدار، کز. ـــ بوون: پەنگ خواردنەوە، هەست لە خۆبڕین، چرچە لە خۆبڕین. واق وڕماو شاش. ـــ کردن: تاساندن. بێ تروسکە. دیینج، کش ومات، کڕومات، بێدەنگ، دڕ، دز، گڕ، داکەوتن، ووست، کپ، بێ دەنگ. قووڵکەی مەڕمەڕینییە و ما تێنی تێدا دەکەن. (ڕۆژ. ، کە. ) تکە.

**ماتە** (کە. ، کۆ. ، ڕەوا. ): بە نزیک گەیشتنی میوە و تەڕەکاری دەڵێن (میوەی فەریک). ـــ بووە: فەریک بووە. بەردی جەهەننەم. برژاندنەوە.

**ماتەمات**: بە ـــ : بە هێواشی، بێ دەنگ.

**ماتۆرە** (باک. ): بێ میقدار، پەست، نزم، بێ نرخ.

**ماتێن**: مەڕمەڕێن، (کۆ. ) مووشانە، (هەو. ) ماتانێ، (شا. ) میتینی، (بابا. ) مووشێنی.

**ماتی**: کرایی، بێ دەنگی، کاسی، بێ هۆشی، ئاسایی.

**ماتیین**: جوورە تفەنگێکە.

**ماچ**: ڕاموس، مۆچ، مووچ، ماچک، (باک. ) ماچۆ. ـــ کردن: ڕامووسیین، ڕامووسان، ڕامیسیین، ڕامووساندن.

**ماچان** (هەورا. ): مەواچان، دەڵێن، دەبێژن.

**ماچە** (کە. ): ئێستریی مێ. (فە. ) جوانوو.

**ماچەنکێ** (کۆ. ): جوورە قومارێکی جگێنییە بە پتە لێ دەدرێ. (موک. ) مەحانچێن.

**ماچک** (باک.): ماچ.

**ماچۆ** (ژا.، شەبە.، هەورا.): دەڵێ، (باک.) ماچ.

**ماچوموورچ**: دووکەس هەر یەکتری ماچ بکەن.

**ماچی** (هەورا.): دەڵێ.

**ماچیچکۆک** (بار.): سێچکە.

**ماخ** (باک.): فاسیلەیەکی جوێ کەرەوەی تیپرانە یەک لە یەکی.

**ماخەر** (ڕۆژ.): ماکەر.

**ماخۆ** (ڕۆژ.): خاوەند، خێوی، ماڵخۆ.

**ماخۆڵیا**: ماخولیا، سەوداسەر، گراو، دڵدار، دێوانە، حەبداڵ، گێژ، خەمخوار، خەمخۆر.

**ماخوولیا**: ماخۆلیا، ــ یی: دێوانەیی، گراویی، دڵداری، خەمخواریی، خەمخۆری، گێژی.

**ماخوولیا**: ماخۆلیا، ــ یی: دێوانەیی، گراویی، دڵداری، خەمخواریی، خەمخۆری، گێژی.

**ماد** (باک.): ڕەنگ، چارە (چهرە)، میزاج، مادێ وی چوویە: ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە، ڕق. ــ کردن: ڕق هەستان. مادێ من ژێ مایە: لێی دڵگیر بوومە. کورد.

**مادا**: کورد.

**مادام**: جوورە پارچەیەکی لۆکەیی و ڕەشە.

**مادانگ**: قەلادە.

**مادانی** (باک.): جوورە بوزرێکە.

**مادە**: شت. (بابا.، هەو.، هەورا.): دۆشەگەڵەی نانییە. (دەر.، هەورا.) کولێرە تەنک و ناسک و گەورە و خڕە کە بە تەندووری برژابێ. (خۆ.) هەورامانی، (دەر.) نانەشینە. برین پێچان.

**مادەک** (باک.): گامێش.

**مادەکریی** (باک.): بەدخوو.

**مادخوەز** (باک.): شاد، پەسند. مادخووز کراو: پەسندکراو.

**مار**: ئەژی. ماریٚ کەرانە. (باک.) جوورە ئاسکێکە. ــ گەزتوو: مارانگاز.

**مارازۆک**: مارێژۆک. گیاییکە لە هەوەڵی شەوێدا تا بەیانی بستێک بڵند دەبێ کە ڕۆژی لێدا پیر دەبێ. ئەو گیایە لەکاتی بارانەدا دەبێ، بە هێلکەوڕۆنەوە سوور دەکرێتەوە.

**ماران**: سەرداو، جێگایەکی ساردە بۆ تێدا ڕا گرتنی شەراب و زەخیرە.

مارانە

**مارانە** (فە.): مۆرانە.

**مارانگاز**: مارگەزتوو، گەزتە. مارانگەزتوو. چارەی لە کوردستاندا ئەوانەن: ١) ترپاک. دەڵێن: کەمێک جێگایەکەی بکرێنرێ و ترپاکی لەسەر دانرێ بەڵان ترپاکەکە تەڕ بکرێ ئەوسا دانرێت. زۆر تاقی کراوەتەوە بۆ دووپشکیش زۆر باشە. ٢) ئاور. دەڵێن: جێگایەکەی کەمێک دەکرێنرێ پۆڵووی ئاوری لەسەر دادەنرێ ئەوسا کەمکەمە ئاوساوییەکەی دێتە خوارەوە تا تەواو دەنیشێتەوە. بۆ دووپشک زۆرتر تاقی کراوەتەوە. ٣) پووشووی نێوداری. دەڵێن: ئەو پووشووەی کە دەیکوشن وێک دێتەوە کە بەر دەدرێ زل دەبێتەوە بە ئاور بکرێ و لەسەر جێگای مار پێوەدراوی دانرێ تا هەمووی دەسووتێ ژەهرەکەی تەواو کۆ دەکاتەوە و دەیکاتە پلۆق و دەردەبێ و کابرا لە مردن ڕزگار دەبێ. ٤) پەڕی تاوسی. دەڵێن: کچە ئینگلیزێک لە هیندستان مار پێیەوە دەدا گەلێکی لەسەر کۆببوونەوە نەیاندەزانی چی لێ بکەن کەچی هیندییێکی پیر ڕادەبرد کە وای دیت دەست بەجێ سەبیلەیەکی پڕ کرد لە پەڕی تاوسی و کێشای و دووکەڵەکەی لەدەم و لووتی کچەکەی دەکرد. کچەکە چاوی هەڵێناو کەمێک وە هۆش هاتەوە ئەوجا سەبیلەکەی لە دەمی کچەکە ناو پێی کوت بکێشە کە کچەکە چەند نەفەسێکی لێدا تەواو چاک بۆوە. ٥) سیریی تەڕ یا ووشک. دەڵێن: جێگایەکەی کەمێک دەکرێنرێ و سیری بە کوتراوی لەسەر دادەنرێ و دەبەسترێ. ٦) گۆرمزە. دەڵێن: هەر چەندی کە ئەستوور بووبێ، گەڵاو لاسکی گۆرمزە بە کوتراوی لەسەری دادەنرێ بە شەو و ڕۆژێک چاکی دەکاتەوە. ٧) نۆشادر. دەڵێن: نیو میسقاڵ نۆشادر لە ئاوێدا بخوا و هێندێکیش لە جێ دەمی ماری بدات مارانگەزتوو چاک دەبێتەوە. ٨) بۆنخۆشکە. دەڵێن: گیایەکە لە زیخمالان دەبێ بۆ مارو دووپشک و کەچەڵی زۆر باشە. بە تەڕیی دیارە بەڵان بە ووشکی کەمێک تەڕ دەکرێت لەسەر جێگا گەزراوەکەی دادەنرێت کە کرێنرابێ. بۆ برینێکی کە حەرارەتی زۆر بێ لەنێو ئاوێدا زۆر دەکوڵێنرێ و تێی دەدرێت. ٩) گیامار: دەڵێن و دیتوومە: پنجە گیایەکە تا دووبست ونیوبڵند دەبێ و لە بنەوە چەند لقێکی باریک هەڵدەچێ و لە بنەوە تا سەری بە بڵاوی بەقەدەر پانی قامکێکی دوو جووتە گەڵایەکی بەرامبەر یەکتری دەر دەکات لەلای سەرەوەش هەر گەڵایەکی کارتەیەکی چکۆڵە دەردەکات کە هەریەکەی ٣ ــ ٤ گەڵای چکۆڵەی پێوە دەبێ. گیامار بۆنی خۆشە بەڵان زۆر تاڵە. گەڵایەکانی وە ئی ڕێحانەی کێویی و سپی دەچێ. گوڵی گیاماری لەلای سەرلکەکانەوە هێندەی بستێکی گوڵی سوور یا سپی یا شین دێنێ، شکڵی گوڵەکانی وە گوڵی گیا چاومژمژەی دەچێ. بنەکەی لەزەویدا بە قەد قامکێکی ئەستوورە بە ڕیشەی ووردو زۆر داپۆشراوە. ئەو گیایە بۆ مارو دووپشک جێگایەکەی دەکرێنرێ و لەگەڵ ماستی بە تێکەڵاوی لەسەری دادەنرێ و دەبەسترێ و دەست بەجێ چای گیاماری چەند ئیستیکانێکی دەدرێتێ. زووی چاک دەکاتەوە.

**مارانگەزتە**: مارگەزتوو، ڕۆژگار دیتوو، تاڵاوی ڕۆژگار چەشتوو.

**مارانی** (دزە.): چتێکە خڕ بهۆنرێتەوە.

**مارە**: مەهر. ــ کردن: ژن مارەکردن. ــ بڕین: مارەبڕین.

**مارە**: ڕاوکە.

**مارەزا**: مارزا، هەوەڵ پیسایی کار و گوێلکانە.

**مارەخۆرە** (کە.): قۆڕیی. دوولقەدەر. ورل.

**مارەزیچکانێ**: (هەو.) گەمەیەکە ١٤ قۆرتان لێ دەدەن.

**مارەزیپو**: هەزار پێ.

**مارەکە** (باک.): زیین.

**مارەکۆڵ** (هەورا.): دووپشک.

**مارەیی**: هەشتیەک، هەشتەک. ــ لێک هاتن: پێ شان، ــ لێک نەهاتن: پێ نەشان.

**مارپێچ**: (هەورا.) میزەگا، (دەر.) گامیزە. جوورە دڕوویێکە. چەشنە پێچێکە. ــ ی جگەر: جەرگ مارپێچی.

**ماردەم** (کەل.): جوورە تفەنگێکە.

**ماردەی** (هەورا.): شکاندن.

**مارز** (موک.): نەفرەت لێکراو.*

**مارزا:** مارەزا.

**مارس:** جنێوێکە بە پیاو ترێنان دەوترێت.

**مارزۆ** (زەن.): هێشتن، لێگەڕان.

**مارستان:** نەخۆشخانە.

**مارگەزتوو:** مارگەزتە، ئەوەی ماری پێوەدابێ.

**مارگیبر** (باک.): مارگل.

**مارگل** (باک.): باڵندەیەکە، مارگیبر.

**مارگیسک** (باک.): جوورە مارێکە.

**مارمارۆک** (باک.): سووسەمار.

**مارماسی:** جەڕی.

**مارماریشۆک** (باک.): مارمارۆک، سووسەمار.

**مارمارێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانەیە.

**مارمەزوولکە** (کف.): مارمێلکە.

مارمەزوولکە

**مارمز** (باک.): زەروو.

**مارمێلکە:** (کف.) مارمەزوولکە، مارمیلۆک، ـــی گەورە: داڵکەمارانە.

**مارمێلۆک:** مارمێلکە.

**مارنەگەز** (هەورا.): چکمە، جزمە.

**مارۆ** (بابا.): بەش، قەشان، ڕەشەوولاغ، ئەسپ یان ماین کە نێوچاوانی سپی بێت.

**مارێژۆک:** ماراژۆک.

**ماری** (باک.): مێیینەی چەند جوورە باڵندەیەکیە.

**ماری ئاوی:** ماری ئاوێ.

**ماری تاڵێتۆزی** (موک.): جوورە مارێکە، ماری تاڵنتۆزی.

**ماری ڕەش:** جوورە مارێکە.

**مارییژە:** گیایەکە هێندەی بەژنێکی بڵندو گەڵای وەکوو ئی مێوێ دێنی بە کولاوی بە خوێوە دەخورێ لەنێو شیرێژیشی دەکەن.

**ماری کتکی:** قووڵە وەیاب.

**مازگ** (فە.): نێوەڕاستی پشت.

**مازبر:** نەخۆشی مەڕانە.

**مازماز** (باک.): خەرت، بەرانی دووساڵانەیە. ـــ خەساندی (باک.): بەرانی دووساڵانەی خەساوە. خەرتی خەساو.

**مازلۆخ** (هەورا.): بەرماڵ.

**مازۆرێ:** تۆراوێکە جێگای خۆی بە جێ بێڵێ و بچێتە لایێکی دی.

**مازوو:** (باک.، کۆ.) مازی، مازوج. ـــ کردن: مازی چنین.

**مازووڤان** (باک.): خانەخوێ، مێواندار.

**مازیی** (کۆ.): مازوو، (هەورا.) پشت.

**مازیی پشتی:** گرێی پشتی.

**ماس** (هەورا.): سەوداسەر، گراو. ماست.

**ماسان:** ئەستووربوون.

**ماساوگێر** (هەورا.): ماسیگرە.

**ماساوی** (هەورا.): ماسی.

**ماسە** (باک.): مێز. کتلە، لم.

**ماسبزان:** لەپێش ئیسلامییەتدا شارێکی گەورە و کۆنی پێشکۆهی لوڕستانێ بووە لەناحیەی ترهان لەلای ڕاستی خەتی سیمرە.

**ماست:** (باک.) ترۆلە. مێست.

**ماستاو:** ـــ کردن: ڕیایی کردن، دەڵەچەکی، مەڵەچەک، (هەورا.) ماستاوە، شیناو، ماستەوا، چەقڵەماست. چەقڵ ماست. ـــ سارد کردنەوە: ڕیایی کردن، کلکەسوورە، ڕواڵەت، خوەلێدانێن.

**ماستەک** (باک.): ڕەحەتی.

**ماستەوا** (باک.): ماستاو.

**ماسک** (بابا.): مەیتەر، بەرچاوتەنگ. (کەڵ.) ئاسکی مێ.

**ماسکە:** مەسخەرە.

**ماسکێش:** گەواد.

**ماسۆڵە** (بانە.): جوورە برنجێکە لەنێوانی سەدری و گردەبیدایە.

**ماسوور** (باک.): قەفی قامیشییە. زاویەدار، گۆشەدار.

**ماسوولە** (بڵ.): جێگایەکی کەمێک ئەستووربێ وەکوو ماسی لە لەشی مرۆ، ماسولکە، تیسمالکی گۆشتی لەشییە. ـــ کوێرە: ڕیخەڵۆکە کوێرە، ماسولکەکوێرە.

**ماسوولکە:** مالۆسکە، ڕەوسە، ئەو کۆما گەفە درێژانەیە لەکاتی بە با کردنیدا لە کای جووێ دەبێتەوە. (هەورا.) ووڵمە. ماسولە، ئەو گۆشتە نەرمانەیە کە بە قوڵ و پۆز و ڕانەوەیە. ـــ دەزوودارەکان: ماسولکەی باریک و داوداوە.

**ماسوولکە کوێرە:** ماسولکەکوێرە، ڕیخۆڵەکوێرە.

**ماسی:** ـــ بە خێوکردن: (باک.) داسی. (هەورا.) ماساویی. ـــ گرتن، ـــ بە دەرکدارەکان. (باک.) ـــ بەمرات. ـــ ڕەشک. ـــ بزریی. ـــ زەرد، ماسییە زەردە. ـــ جەور. ـــ چەلەکی. ـــ مرتالەک. ـــ فلەهی. ـــ کوولووچمار. ـــ پۆلا. ـــ ڕجووک. ـــ سەرنگ. ـــ شەبۆت. ـــ تەریویی. ـــ سەرک. ـــ سەرگۆلک. ـــ سمبێلک. ـــ شەلق.

**ماسیان:** هەڵامسان، بەستن، بەستەڵەک.

**ماسیاوەن:** ڕەق هەڵاتوو لەبەر ساردی، بەستراو.

**ماسییەپانکە:** جوورە ماسییەکی پانە. ـــ زەردە: ماسییێ زەرە، جوورە ماسییەکی زەردە، زەردەماسی. ـــ گووڵە (موک.): جوورە ماسییەکە.

**ماسییەوان:** ڕاوکەری ماسییان، (باک.) ماسیڤان. ـــ ی: کاری ماسی گرتن.

**ماسییرە** (فە.): سستەمر.

**ماسیڤان** (باک.): ماسییەوان، ڕاوکەری ماسییان.

**ماسوگیر** (هەورا.): قاق.

ماسیگرە

**ماسیگرە:** باڵندەیەکی سپییە گۆشتی دەخورێ.

**ماسیگرەک:** (ئەردە.) زیقاوڵە. (باد.) تەستەزیینک. قاق.

**ماش:** ـــ کردن: مانەوەی ئاو. ـــ و برنج: تەنیا بۆ ڕیشی بەکاردەبرێ کە ڕەش و سپی تێکەڵاو بووبێ.

**ماشاندن** (موک.): تواندنەوە، کرۆشتن (بماشیینە).

**ماشە** (موک.): مقاش، پەنگرگر، پەلگرک، (باک.) پەلگر، (خۆ.) پەنگرکێش، مەقەش، کلاًفە، گاسک، (باد.) گازک، (باد.) بقە، سیپەلاًن: لەنێو یا لە کەنار چۆماندا بە تانۆک و نیدیی چتێکی دروست دەکەن ماسی دەچێتە نێو و دەیگرن. بە ـــ گرتن: چمک دان. ـــ ی تفەنگێ: مەقەنەزمە. ـــ ی ئاوریشمی: چەکە.

**ماشەر:** کلاًفە بەنێکە لەنێوان دوو ئەژنۆدا هەڵ دەکرێتەوە. ـــ ی بەنی. (شار.) تاقمی جۆلاًیی.

**ماشەرە** (کۆ.): گیا مامزە وەکوو کەر خنکێنە وایە.

**ماشتە** (کەل، زەن.): کۆڵوانە.

**ماشتن:** ماڵین. (هەورا.) ماڵای.

**ماشران:** گەسک دران، ماڵران.

**ماشک** (باک.): گیایەکە.

**ماشۆت** (باک.): کرمی دارێ.

**ماشێن:** مەکینە، سەیارە. ـــ ی دروومانی: ماکینەی جل دروون. ـــ ی ڕێگای ئاسن: قیتار، شەمەندەفەر.

**ماشین:** ماڵین.

**ماشینە:** شۆرباوی ماش. مەکینە، چەرخ.

**ماشینەوە:** ماشین و ڕادانی هەموو شتێک.

ماشینگ

**ماشیینگ** (باک.، باد.): باشوکە.

**ماف:** حەق. بافت. (خۆ.) گە. ـــ ی پاشە ڕۆژدانان: مافی بڕیاری چارەنووس.

**مافەتە** (هەورا.): کرمێکە لەنێو گیایدایە چقڵی گیای بە لەشییەوە نووساوە ئاژاڵ کە بیخوا پێی دەمرێ. دەردێکی ئاژاڵان و مرۆیانە. خۆرە. گیایەکە ماڵات بیخوا پێی دەمرێ. (پژ.) ڕێنج، (گەورگ و مەنگوڕ) گیابڕ. لە لای مەردوخی سورقە کرمێکی گچکەیە لەنێو کاو کۆلیدایە مەر بیخوا پێی دەمرێ.

**مافر** (باک.): چونکوو، وەکوو.

**مافوورە:** فەرشێکە لە خوریی بەرز دروست دەکرێ، خالی، خالی، قالی، بکۆ، بسکۆ، (باک.) لۆپ. ـــ ساز: مەفوورکار.

**ماقوول:** بەڕێز، سەنگین، بەڕوو، سەنگیین وگران. ـــ ی: بەڕێزی، سەنگینی.

**ماک** (کە.): هێلکەی گونییە. (فە.) تفەنگ، کونە لووت. گلێکە هەوێنی دژشاوییە. مەستی و سەرخۆشی. بنچینە. میکرۆب. بنچینەی برینان. ـــ ی خەیرکە: (باک.) پارزا. کوتان. پارزادان. ـــ ی لێ پیس کردن: تەشنە کردن. (باک.) دایک، دایکی بێچووە بەرخ وکارییە. مێ. مێیینە. (هەورا.) خالی گەورە و پەڵەی گەورە. پارچە خاکێک و نیدی. (باد.) دایک. زمانی دایک. لە زاراوەی کۆنیشدا بەکار براوە وەکوو دوژمنێک گازی دوژمنی خۆی کرد گوتی: هەی ئەسپێ من ئد ژن ماکێ تە گای: وای هەسپێ من ژن و دایکی تۆی گابێ.

**ماکاش** (باک.): خێڵ.

**ماکاو** (کە.): ماکاوی برنجی. زەوی مەرەزە کردنە چەند بەشێک بۆ ئاودان.

**ماکەر:** ماخەر. کەری مێ. مۆکەر.

**ماکەو** (هەورا.): چیپلی.

**ماکەدەر** (سوو.): مەسدەر.

**ماکێش** (باک.): پلاًوپارزن، قاپێکی کون کونە بۆ چت پالاًوتن.

**ماکێنە:** ماشینە، چەرخ.

**ماگە:** ماوە.

**ماڵ:** مرلک، کردنە ـــ: ساخ کردنەوە، ماف سوورکردنەوە. ئەوەیە کە مرۆ هەیبێ، دەست پێ داماڵین، هەورێ، پارەیەکە لە بری زێڕو زیو و جل و بەرگ یا لە جیاتی خوێن بدرێ بە ماڵی بووکی. ژنی خاوەن ماڵ، خانوو، خانەوادە، مندال، (باک.) پەرگال. (هەورا.) یانە، (لو.) خانە، دێلییز، خوەمالی، خوەدیتی، سامان، بڕوانە: ماڵات، ماڵدار، ماڵداری، بێ ـــ: (باک.) بێ دارماڵ، هەژار. بە ـــ: دەوڵەمەند، خاوەند. ـــ کردن: ماڵ و ناوماڵ پێکەوە نان. جووێ بوونەوە، ماڵێک بکرێتە دوو یا چەند پارچەیەک. زێی وولاخ و ئاژالانە. ـــ اتە ئاقا: مەمنوون، ماڵت ئاوەدان. ـــ ا خودێ: مزگەوت، ماڵی خوا. زەکات.

**ماڵات:** ماڵیات، وەڵس، (کە.) وولس، دەوڵەت، بزن و مەڕ و ڕەشەوولاخ، ئاژاڵ، (باد.، هەورا.) ئاژەڵ (یی وورد). گاو مانگاو نیدیی، ڕەشەوولاخ، چاورا، وولاخ.

**ماڵاڤا** (باد.): ماڵیاوا، بمێنی بەخێر. ـــ یی: ماڵاوایی.

**ماڵان:** ماڵانن، ماڵین.

**ماڵاو** (ڕۆژ.): مەڵە.

**ماڵاوا:** ماڵیاوا، بەدوعا، سوپاس. ـــ یی: شوکر، ماڵاڤایی، ماڵیاوایی، سوپاس کردن، سوپاس.

**ماڵای** (هەورا.): ماڵیین، ماڵشتن.

**ماڵە:** (هەو.) ماڵنج، مۆڵە، هەمریی یی. ـــ کردن: مۆڵەکردن. (کە.) ماڵووی جووتی. دەردێکە لە دەم و چاو یا لە گەرووی ژنی ئاوس دێ.

**ماڵەر:** گەسک لێدەر، ماڵشتە.

**ماڵەوماڵ:** گەڕان بە ماڵاندا.

**ماڵبات** (باک.): بنەماڵە.

**ماڵبەنان** (ڕۆژ.): مەڵبەند، قۆناخ.

**ماڵبەند:** مەڵبەن.

**ماڵبڕین:** دزی لێ کردن بە بڕینی دیواری خانوو و چوونە ژوورەوە.

**ماڵپشکنین:** کۆڵینەوەی ماڵ بۆ گەڕان بە دوای شتێکدا. *

**ماڵچە هنوو** (باک.): جوانووی مێ.

**ماڵخۆ:** خاوەند، (باک.) ماڵخوێ، خاوەن، ماخۆ.

**ماڵخوێ** (باک.): خاوەند، خیوی.

**ماڵخی ماڵ:** خاوەند ماڵ، خیوی.

**ماڵخیر** (باک.): جوورە تفەنگێکە.

**ماڵ کاول:** ماڵ وێران، ماڵ کەمباخ.

**ماڵدار:** دەوڵەمەند.

**ماڵدەر:** دەست بڵاو، چاوتێر، دڵفراوان، بەخشش‌کار.*

**ماڵران:** گەسک دران، داماڵان، داماڵران.

**ماڵداریی:** ئابووریی، وەرام، پاشەکەوت، دەوڵەمەندیی، گردوواری، گردوکۆ.

**ماڵزاروک** (باک.): یزدان، تۆڵدان.

**ماڵستە** (باک.): رەنگکەر، رەنگین.

**ماڵستن** (باک.): رەنگ کردن. نەخش کردن.

**ماڵشت:** شێلان.

**ماڵشتە** (لو.): گەسک لێدەر (کەنناس).

مالشتە

**ماڵشتن:** گەسک لێدان. (بماڵە).

**ماڵک** (باک.): خانووچکە، خانووی چکۆڵە، کوڵێت. کالان. ماڵ و سامانێکی کەم.

**ماڵ رێک خستن:** دانانی کەل و پەلی ناوماڵ بە رێک و پێکی.

**ماڵکەک:** لە باسی هەڵبەستاندا بەکاردەبرێ، بڕوانە فەرهەنگی کوردی و فەرەنسی.

**ماڵکەیی:** موفلیس.

**ماڵم:** پیاوی ئایینی جوولەکان.

**ماڵ ماڵانێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانەیە.

**ماڵماڵۆک** (باک.): جۆرە هەڵپەرکێیەکی کوردییە.

**ماڵ گرتن:** پارە پاشەکەوت کردن.

**ماڵ گر:** ئەوەی پارە پاشەکەوت بکات و خەرجی نەکات.

**ماڵمیڤان** (باک.): ئوتێل، میوانخانە.

**ماڵنج** (خۆ.، سۆ.، دزە.): ماڵە. ـــ کردن: ماڵەکردن.

**ماڵۆدەر** (هەو.): کاتێکە لە بەهاراندا کە دێهاتییان ماڵان بەجێ دێڵن.

**ماڵۆچە:** مالویچە، گیایەکە گەڵای درێژە وەکوو لاولاو وایە.

**ماڵۆچکە:** ماڵی بچووک.

**ماڵۆس:** بەرازیی مێ.

**ماڵۆسکە** (کۆ.): ئەوکۆمای دەغڵە درێژانەیە کە لە دەمی بە با کردنیدا لە کا جوێ دەبێتەوە.

**ماڵوو:** (باد.) تەپان، (هەو.) رەوسە، ماڵنج. شڤنە، شنگیینی، ماڵە، ماڵگیر.

**مالووسکە:** جێگای دار و قامچی هەڵاییسان.

**ماڵوێران:** ماڵ کاول، ماڵ کەمباغ، لێ قەوماو و چارەڕەش، هەی ـــ خۆم: هەی لێ قەوماو و ماڵکاول خۆم.

**مالوێچە** (رۆژ.): ماڵۆچە، گیایەکە بۆن زۆر باشە. لاولاوەی کێوییە.

**ماڵوێنچە** (بابا.): ماڵوێچە، گیایەکی رەوانە.

**ماڵ ومناڵ:** خاوخێزان.

**ماڵهات** (باک.): خانەدان، خانەوادەی نەجیب و شەریف. (باک.) ـــ ی: خانەدانی.

**ماڵی:** کەویی، متۆ، متوو، خانەکی، لیینی.

**مالیات:** باج سەندن.

**ماڵیئاوا:** ماڵاوا، پنیوس، ئەو دەمەی لای ئێوەمان خۆش. ووشەیەکە لەکاتی بەجێ هێشتنی کەسێکی یا چەند کەسێکیدا بەکاردەبرێ. (هەورا.) خواچەنی. مەمنوون، سوپاست دەکەم. ـــ یی: ماڵاوا. سوپاس.

**ماڵیان** (لو.): مالیهات.

**ماڵیسۆک:** چڵە گیایەکە نیو گەز بڵند دەبێ پەلکی وەکوو ئی ترشۆکەی باش دەچێ بەرەکەی سوورە وەکوو دەنکی سماقییە و ناخورێ.

**ماڵیین:** سوونەوە، ماشتن، داماڵین، (لور.) ماڵیان، (هەورا.) ماڵای، گەسک لێدان، دەست پێداهێنان.

**ماڵیینەوە:** کۆکردنەوە سەر یەک.

**مام:** برای باوک، (باک.) ئاپ، (باک.) هاپۆ، ئاپۆ، (رۆژ.) مامک، مامۆ، ماتک، (فە.) ئام.

**ماما** (کە.، هەورا.): نەنک، داپیرە.

**ماماڵە** (هەورا.): جاڵجاڵووکە. خاڵخاڵۆکە. پیرێژنێکی پیرو وێکهاتووە.

**ماماڵی** (هەورا.): ماماڵە.

**مامان:** (باک.) پەژاج، مامەچەر، ئەو ژنەی یارمەتی منداڵ بوونی ژنان دەدا، (لو.) مامو. ـــ ی: پەژاجی.

**مامە:** لەکاتی بانگ کردنی مامدا بەکاردێ، مامۆ، (هەورا.) نەنک، داپیرە.

**مامەحووجێ** (کۆ.): بابۆڵەی نانی.

**مامەش:** عەشیرەتێکی کوردە.

**مامەند:** نێوی پیاوانە.

**مام برایمە** (موک.): ترێی دۆشاوی، جۆرە ترێیەکە.

**مام جیزنۆکە** (بابا.): (موک.) پالقوزە.

**مامچە** (فە.): مامەچە، مامان.

**مام دەرزیلە** (خۆ.): دەرزییلە (گیایەکە).

**مامر** (دەر.، کە.): مریشک.

مامر

**مامرەچیینی** (کە.): مریشکەچیینی.

**مامرەڕەش** (رۆژ.): باڵندەیەکی رەشی ئاوییە وە مراوی دەچێ.

**مامرغ** (باک.): باڵندەی چکۆڵە.

**مام رێواس:** گیایەکی کێوییە وە ئانی حاجی لەگلەگی دەچێ بەلان گەڵای لە نیی وێ پانترە کەسێکی کرمدارێ بە کاڵی یا کوڵیوی یا بە چێشت بیخوا زۆر بە سوودە، (باد.) تۆلەترش.

**مامز:** ئاسک. نێوی ئافرەتیە.

مامز

**مامزە:** مەموز. ئاسنێکە پوولەکەیەکی پێوەیە لە پشتی پانیەی چەکمان دەدرێ تا زرینگەی لێ بێ و وولاخیشی پێ لێ دەخورێ و لەپێشدا پاڵەوانان بە کاریان دەبرد.

**مامش:** کپ، بێ دەنگ.

**مام شەبەقە:** ددانەمشکە.

**مامک** (باک.): مەتەڵە، تشتەنۆک. (ڕۆژ.) مام.

**مام کوڕ:** تیرەیەکە لە بادینان.

**مامگ** (شو.): مام.

**مام میرانی:** گیایەکە بنەکەی دەکوترێ و بە ووردی وەک تۆز دەخورێ بۆ زگ ئێشەو مایەسیری زۆر باشە.

**مام نەبیلە** (خۆ.): گیایەکە وەلارلاری دەچی.

**مامۆ** (هەورا.): مام، مامە.

**maموونە:** شیرەی خوژییلک.

**مامۆتک** (دەر.، برا.): زانا، (هەورا.) ژیرلۆ، ژیر.

**مامۆخ** (باک.): مامۆک، جوورە هەڵوجەیەکە.

**مامۆرە:** جوورە ترێزۆکە.

**مامۆزا** (باک.): ئامۆزا (بۆ کچ).

**مامۆزازا:** بن ئامۆزا.

**مامۆژن:** ئامۆژن.

**مامۆسا:** مامۆستا.

**مامۆستا:** زانا، زانەر، سەیدا، مامهۆستە، مامۆسا.

**مامۆک** (باک.): جوورە هەڵوجەیەکە، (باک.) مامۆخ.

**مامهۆستە** (باک.): مامۆستا.

**مامی خاڵۆس** (هەورا.): گەمەیەکە.

**مامییرب:** مامییرانی. زەردە چێوەیەکە گرە و پێوە دەنووسێ.

**مام مییرانی:** مامییرانی، گیایەکی تاڵە بنەکەی بە ووشکی دەیکەنە تۆز و دەخورێ، بۆ زگ ئێشە و مایەسیری زۆر باشە.

**مامێتی:** مامییتی.

**مامییتی** (باک.): مامێتی.

**مامێز:** نەقیزە.

**مان:** ئاوازی چاوگ وەکوو: دوورومان. ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی کۆ: دایکمان. ژیان، مایین (بمێنە)، مانەوە. جەنە، ڕق، هۆک، ورک، ــ گرتن: سل بوون، ڕک گرتن، زیزبوون. ــ گرتن (کەر و وولاخ): هەڵتیزان، هەڵتیسکان.

**مانا:** مەعنا. مانا لێدانەوە: ڕوون کردنەوەی واتا. ــ یی: مەعنەوی.

**مانەکی** (ڕۆژ.): ماندوێتی.

**مانەوە:** مان.

**مانتین** (باک.): جوورە پارچەیەکی ئاوریشمییە.

**مانی:** دوارۆژ.

**ماندوو:** کەشەنگ، کەشەن، کفت، شق، خاوروفش، دەوخ، مانیا، شەقی، شەکەت، ماندیی. ــ بوون: قەرملیین، (هەو.) قەمیین، لەبکیین، چرووسانەوە، دەوخیین، جەفلیین، ئەرخیین، بەتلیین، (باک.) هەفان، وەستان، وەستابوون، وەستیان. ــ کردن: (باک.) ئەرخاندن، بەتلاندن، دەوخاندن، هەفاندن، چەوساندنەوە، چرووسانەوە، لەبکاندن، قەرماندن، قەرملاندن، هەرشاندن. ــ نەبی: شەقێ تە.

**مانگ:** هەیڤ، هەیوی، هاییڤ، هەیوو، مانگی ئاسمان، مانگی سی ڕۆژ، (هەورا.) کاوت، مۆنگ، هەڤی، هەوی. ــ ی ڕۆژووان: ڕەمەزان، مەه، ۳۰ ڕۆژ: سەوورووک. گیرانی ــ : مانگ گیران. ــ هەڵاتن: دەرکەوتنی مانگ. دەردێکە تووشی مندالان دەبێ. ــ ی یەک شەوە: هیلال.

**مانگا:** (هەورا.) چێڵ، مانگاوە، (باک.) چێلەک، (هەو.) چێر، (باڵ.) چیپۆک.

مانگا

**مانگادۆشە:** گادۆشە، ئەو بادییە کە مانگای تێدا دەدۆشرێ.

**مانگار:** باقی.

**مانگاماسی:** جوورە ماسییەکە، (دەر.) باقۆ.

**مانگانە:** مەهک، مەهی.

**مانگاوێ** (هەورا.): مانگا.

**مانگەڕۆژ** (زەن.): مانگەشەو.

**مانگەشەو:** ڕووناکی مانگییە، هەویەشەو، هەویۆک، (باک.) تاڤهەی.

**مانگ ڕوو:** نێوی ئافرەتییە.

**مانگ وەرگرتن:** مانگ گییران.

**مان گرتن:** ئیزراب.

**مانگ گیران:** گیرانی مانگ. برزبوونی بەشێک یان سەراپای مانگ لەو کاتەی هەڵاتووە، لەبەر ئەوەی زەوی دەکەوێتە نێوان ڕۆژ و مانگ و لێ ناگەڕێ تیشکی ڕۆژ بە تەواوی بگاتە مانگ.

**مانگێر** (باک.): ماڵوو (ئی جووتی).

**مانگی:** ماندوو، مەهی. ــ تازە: هیلال، ــ ی چاردە: چاردەچەڤێ. ــ ی نوێ: هیلال، ــ ی یەکشەوە: هیلال، هەیڤا ئێک شەڤییە.

**مانن:** ماندووکردن.

**مانیا** (هەورا.): ماندوو.

**مانیاگ:** ماندوو، شەکەت.

**مانیای** (هەورا.): ماندووبوون.

**ماوەر** (هەو.): کوپین، چەکووچی گەورەی بەرد شکاندنییە.

**ماوەی سڕبوون:** مارەی مت بوون.

**ماوت:** پارچە، چوخ، جوورە پارچەیەکی خوورییە.

**ماوت ماڵ:** فرشە.

**ماودا:** ماوە، ماوا، نێوان، مەودا. ــ دان: مەیدان دان.

**ماولۆیی:** هۆزێکی کوردە کەوتوونەتە نێوانی گەردی و خۆشناوان.

**ماووزەڕ:** جوورە گۆرانییەکی کوردییە. ماویزەڕ، ماهووزەڕ.

**ماوزۆ:** بەجێ هێشتن.

**ماویی** (بار.): بەرازی مێ، مالۆس.

**ماوییزەڕ** (باک.): تفەنگی ماووزەڕ.

**ماە:** چیا، شاخ، کێو، شکێر، کێوێکە یەگجار سەخت و بڵندبێ.

**ماهەر** (شو.): ماکەر.

**ماهشەل** (باک.): قایەی مێوێ.

**ماهۆن** (باک.): ماهی. دەسکی چەقۆیە لە داری مێوێ دروست دەکرێ.

**ماهوو** (باک.): ڕاهب. کارەکەر.

**ماهی**: شاخێکە لووس و مەیلەو خوار بێت، بەدەسکی خەنجەرانیش دەڵێن کە سپی بێ، جوورە ئێسکێکە دەکرێتە دەسکی خەنجەران. ماهۆن.

**ماهییچ**: گۆشتە نەرمەی پێ.

**ماهی دەشت**: مەحاڵێکی گەورەیە لە خاکی ئەردەلاندایە چەندین هۆزی تێدایە.

**ماهی زەرد** (جا.): قوولایی قەدی شاخانە.

**ماهیینی** (زا.): ماین.

**مای** (هەورا.): هەڵدێر.

**مایان** (باک.): هەوییینی پەنیری.

**مایانۆک** (باک.): ئەوانەی کەدەڕوێن.

**مایە**: ماوە، سەرمایە، دەست مایە. ـــ ی کاروکاسبی، هیولی، مادە. ـــ ی نەخۆشی: جرثوم. دۆز، هۆ. بە ـــ: ئەوەی مایەی هەبێ. بێ ـــ: مایەپووچ. (هەو.) ماوە. هوین، مایان، مایە بۆ پەنیری.

**مایەپووت**: نابووت، سەرسەری.

**مایەپووچ**: نابووت.

**مایەدار**: سەرمایەدار. ـــ ی: سەرمایەداری.

**مایەسییریی** (هەو.): بیوەسییری.

**مایەمێو** (موک.): ترێیەکی سپییە دەنکی لە ئەی فەرخیی کورتترە. دەنکی هەیە.

**مایەندە** (باک.): ئیدی، هەتا هەتایە.

**ماین**: ماهین. مانەوە، مان.

**ماینە**: مێ.

**مایچە** (کەل.): پارچە زێڕێکە لەنێوەڕاستی بەرموور و گەردنبەندیدا دەکرێ. (موک.) ئێستری مێ، ماچە، مەیە. نەرمەی پێ (گۆشت).

**ماین**: ماین، وولاخی بەرزە، ماهیین، (باد.) مەهیین. مان.

**ماین ماییناێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانە.

**مایینە** (باک.): مێیینە.

**مە** (موک.): ئێمە، بەڵاَن بە تەنێ بەکار نابرێ، بە مەیان گوت: بە ئێمەیان گوت، دای بە مە: دای بە ئێمە. (زا.) ئێمە: پێشگری نەهێشتنە (مەخۆ).

**مەبادا**: نە وەکوو، نەکوو، نەک.

**مەبەس**: نەچک، خەلەسکوو، سەردڵ، گاڤیین، مەبەست، نیشانە، ئامانج،مد ئارمانج، دڵخواز، مراز.

**مەبەست**: مەبەس.

**مەبۆ** (هەورا.، پاوە.، خا.، ژاوە.): دەبێ، ئەبێ (نەمبۆ: نابێ). ـــ (هەورا. گەرمێنی): نابێ.

**مەبێ** (هەورا.): دەمرێ.

**مەتارە**: مەتەرە.

**مەتەر** (زا.): مادە.

**مەتەرە** (باک.): مەتارە، توورەکەیە لە پارچە یا تەنەکە بۆ ئاوی بەکاردەبرێ.

**مەتاڵ**: قەڵخان، مەرتاڵ، مرتاڵ، (لو.) ئەسپەر، (موک.) پەنییرێکە لەنێو توورەکەیدا چۆڕابێتەوە و بووبێتە سەلکێکی زۆر زل. ـــ گیر: مەرتاڵ گیر.

**مەتە**: کونکەر.

**مەتەرێز**: پشت بەرد یا دیوار و جێگایێکە شەڕی لێ بکرێ، دیواری شەڕی، سەنگەر، تابیە.

**مەتەفەرەنگی**: کونکەر، درێرک. *

**مەتەڵ**: مەتەڵۆک، مەتەڵە.

**مەتەڵە**: مەتەڵۆک، تشتانۆک، مامک، قروسەلە. ـــ داهێنان: دروست کردنی مەتەڵە.

**مەتەڵۆک**: مەتەڵە، تشتانۆک.

**مەتەوکەوانە**: ئاسنێکی لووت تیژە و بە زێی کەوانەیەک دەخولێنرێتەوە و داری پێ کون دەکرێ.

**مەترەباز** (باک.): چاپلووس، جامباز، ئەسپفرۆش.

**مەترەق** (کە.): کوتەک.

مەترەق

**مەترسی** (بابا.): ترس.

**مەتی** (هەورا.، سەق.): پاڵقۆزە.

**مەجرەفە** (باک.): سەتل.

**مەجرییکەنی** (هەورا.): دووارد، مقەست.

**مەجووسی**: مەجووس. ئاگر پەرست.

**مەجووجە** (باک.): غەمگین، بەدخوو.

**مەچ**: قەیدک، مەچی دەستی.

**مەچەک** (هەورا.): گە (مەچەکی دەستی، گەی دەستی)، بازندە، بوقی باسکی بازواندە، باق، زەند. فەرشک.

**مەچەکدان** (موک.): کوللە، پەردەی سەرتەختی نووستنێ.

**مەچییر** (مەر.، دەر.، شێخ.، فە.): دەزوو.

**مەچییرە** (کە.): سەرەتاو بەرایی قەوچەی ماکەو و ئیدیکە.

**مەحتەل**: گردەنشین، گیربوون، ڕاگیران، گیرۆ، پەک کەوتوو، دەستەپاچە. ـــ بوون: پەک کەوتن، بەندبوون. ـــ کردن: بەندکردن، پەک خستن، بەر هەڵست کردن.

**مەحچەچە** (هەو.): خرنووکی ووشک.

**مەحکەم**: ـــ کردن: ڤەبرین. نا ـــ: ناقایم، زوگووت، دەبان، (باک.) ڕەوال، قایم، توند، پتەو، ڤەبری، بەجەم، کرار، کەیار، پکێت، تۆیز. ـــ ی: توندیی، قایمی.

**مەحلان** (باک.): کارزان، قابیل. زانا، هونەرمەند، کارساز، شارەزا، (باک.) چستە.

**مەخەر** (باک.): ڕەچەڵەک، دەشت.

**مەختی** (باک.): بێستانی کاڵەک و شووتی.

**مەخەڵ** (باد.): مزڵگە.

**مەخز**: مەغز. مەخزی بادام.

**مەخسەرە**: دەردەسەری، چەرمەسەری، ئازار، ڕەنج. شەڕوکێشە، بەڵاَ، موسییبەت.

مەخشەڵ

**مەخش:** مەشق.

**مەخشەڵ:** مەشخەل، چراوگ.

**مەخلێلات** (باک.): ترێزوو.

**مەخمەر:** فرەز، (باک.) قووتوو، دۆڵچە، سەتل.

**مەخمەڵ** (باک.): خاولی.

**مەخمەلات** (باک.): شێلم.

**مەخمەلەک** (کر.): نەخۆشییێکی منداڵانە.

**مەدبەند** (ڕەوا.): نێو لانکی منداڵان، ئەو کەل و پەلانەی نێو لانکیییە.

**مەدرەخە** (باک.): ئەسپەرەی بێڵ و پێمەڕەیە بۆ ئەوەی پێی پێ دانرێ.

**مەدفیینی:** (زاخ، بۆتا.) مەدوونی، (باک.) مەدفوونی، هەموو جوورە شۆرباوێکە، بە هی برنجی دەڵێن: شۆرباوی برنج.

**مەدوونە** (هەو.): قاپێکی گچکەی مس بووە ڕۆن گەرچک یا دۆنیان تێ دەکردو پلیتەیان تێدا دەناو سەری پلیتەکەیان ئاور پێوە دەنا لە جیاتی چرا، (شن.) نەستێولک.

**مەدۆنە** (کە.): پارچە ئاسن یا تەنەکەیەکە مزی تێدا دەتوێنرێتەوە.

**مەڕ** (هەورا.): مەگەر، (باک.) پێمەڕە، خاکەنداز، ـــ دان: خاوێن کردنەوە. (ڕۆژ.) مێ. ـــ ی شاخدار: جەرنە، پەزی سپی، پەزی مێشینێ، شەکەمێیەکە گەیشتبێتە سێ ساڵان. بەردیلی سێ ساڵانە دەبێتە مەڕ، میهی، مەهی، مەهە، مەهـ، مێش. مێگەل، لەگەلدا بۆ نێر و مێ بەکاردەبرێ، ئی، هی، ئارزی، بەستە، لە مەڕمنە: هی منە، لە ـــ : ئارزیی، ئی، هی. (هەورا.) ئەشکەوت. هۆڵی مەڕانە لە کێوان.

**مەڕاز:** مراز، ئامانج.

**مەڕازە** (باک.): ساڵێکە لە تەمەنی سەگی، ئەڤە سێ مەڕازە: ئەو سەگە سێ ساڵانیە. ئالووهاتن، بن شەویلکەکان ئەستوور دەبن و تف قووت نادرێ. مەڕازە هاتن، مەڕازە کەوتن.

مەراڤی

**مەڕاڤی** (باک.): مراوی.

**مەڕاق:** ئارەزوو.

**مەڕاقدار:** ئارەزوومەند.

**مەڕان** (باک.): یاسەمەنە، داروگوڵ.

**مەڕانە:** کوودە، کۆدە. جوورە دارێکە.

**مەڕاندن** (باک.): جوولاندن، ڕاوەشاندن (بەرپینە).

**مەڕایی** (باک.): مەلەچەک، کلکەسووتە، ماستاوکردن، ڕووالەت، چاپلووسی، ـــ کەر: ماستاوکەر.

**مەڕە** (بابا.): حاڵەت، بار، مەرەد، دەرد، نەبوون، ئەوانەش بە ـــ ی ئەوان بچن.

**مەڕەد** (باک.): مەرە، پەنجەرەی چکۆلە، ڕەواق.

**مەڕەز:** مەرز، تووکی بزنە مەرەزییە کە هەموو ڕەنگێکی هەیە درێژەو نەرمە بۆ ڕانک و چۆغە دەست دەدا، بزنێکی هەموو ڕەنگیە تووکەکەی درێژو تیسکنە و نەرمەو بۆ ڕانک و چۆغە دەست دەدا، مەرز. کەژ.

**مەڕەمووز:** پیاوی تەواو پوخت و کوڵاو وەکوو دەڵێن: هەتا بۆز نەبێ مەڕەموز نابێ، تا مرۆ سەرو ڕیشی بۆز و سپی نەبێ نابێتە پیاوێکی تەواو.

**مەرەزا** (فە.): مەڕەمەڕ، باڵەی مەڕان.

**مەرەزە:** چەلتووکجاڕ، جێگاو مەرزایەکە برنجی لێ چێنرابێ. برنج لەکاتی سەوزیدا.

مەرەکەب

**مەرەک** (باک.): ئەنباری گەنم.

**مەرەکەب:** حبر. ـــ دان: دوێت.

**مەرەکەمەرەک** (کە.): پیلە.

**مەربەخ** (باک.): هەڵقەندن (بیبیرو هی تر). ـــ کردن: هەڵکەندن.

**مەرەکیویی:** پەزی زۆزانان، پەزی سۆز.

**مەربەن** (کە.): گوریسێکی درێژە بۆ لەوەڕان لەدەستی وولاخی دەکەن و سەرێکی لە چتێکی قایم دەکەن، زنجیرێکە لە پێ و دەستێکی وولاخی دەخرێ یا لە دەستێکی دەخرێ و بە گوڵمێخی قایم دەکرێ. سندم، پێوەند.

**مەربەند** (شار.، باک.): سندم، پێوەند.

**مەرجاپییلک** (خۆ.): گیایەکە بەهەزەویدا پان دەبێتەوە و گوڵی زەردە بنەکەشی وە گێزەری دەچی و دەخورێ.

**مەرپێر** (باک.): پێمەڕە، بێڵی ئاسن.

**مەرتاندن** (باک.): بەمرتێنە، تووێژ یا پێست لێ کردنەوە.

**مەرتال** (باک.): مەتاڵ.

**مەرتال گێر** (باک.): مەتاڵ گێر، کەسێکە مەتاڵ بەکار بیات.

**مەرتیین** (باک.): بەمرتە، تووێژ و پێست فڕێدان.

**مەرج** (کە.، هەو.): گرێو، گرۆ، گرەو.

**مەرجان** (باک.): باڵندەیەکە. بستام. جوورە زیندەوارێکی دەریاییە وە گیا و داروباری دەچی و بە بنی دەریاوە نووساوە. لەپێشدا ئەوریان بە گیایەکی دەریایی لە قەڵەم دەدا. هەندێکیان مەرجانی سوورە وەکوو گوڵ لەسەر لکی قسلاوییە لە گەوهەرسازیدا ئەوی بۆ ڕازاندنەوەی کەرستەی چتەکی نرخدار بەکار دەبەن. هێندێک مەرجان بە زۆری لەیەک شوێنیدا دەست دەکەون و سفن (مادە) ی قسلی لە دەورەی خۆی دەدەڵێنێ.

**مەرد:** پیاو، سەخی، ئازا.

**مەردال** (باک.): چڵکن.

**مەردان** (باک.): کوتک (چەکووچی دار).

**مەردانە** (باک.): سەخیانە، ئازایانە، پیاوانە. لوولە.

**مەردایەتی:** پیاوەتی، پیاوێتی.

**مەردوم:** مەرد، مرۆڤ، ئینسان، بەشەر، مەریتە.

**مەردەمێر** (باک.): جوامێر، پیاو. ـــ ی: سەخاوەت، جوامێری.

**مەردەکار** (باک.): بەکار، کارکەر.

**مەردەوان** (باک.): پلیکانی قوڕ و خشت و ئیتر.

**مەردەی** (هەورا.): مرۆڤ.

**مەردیاق** (باک.): جوورە پردێکە لەداری باریک کاریتەو ئالودار. *

مەردیبوان

**مەردیبوان** (باک.): نەردیبوان.

**مەرز** (باک.): مەرەز، (باد.) زەوی نەکێڵراو، قەڵس. ـــ بوون: قەڵس بوون، هەرپەندمان. ـــ کردن: هەرپەندماندن.

**مەرزاو:** کەناری ئاوی تەنک.

**مەرزەبان:** فەرمانداریّکی کورد بووە لەپێشدا.

**مەرزم** (ڕژ.) : پلووسک.

**مەرزنجۆش** (کۆ. ، ئالا.) : گیایەکە تام و بۆنی وە چای دەچیّ کەمیّک بۆ خاوی لیّ دیّ.

**مەرزۆنە** (باک.) : جوورە ترێیەکە.

**مەرزووب** (ڕژ.) : پلووسک، مەرزم.

**مەرزیب** (فە.) : پلووسک، سوولاوک.

**مەرزینجۆش** (کۆ. ، ئالا.) : مەرزنجۆش.

**مەرس** (کە.) : ڕقدار. ــ بوون: ڕق هەستان. لە قومارێدا دووجار بیرێتەوە. شاشی نێوانی خەتەکانی جووتییە. جووتیار کە جووتەکەی لە بەرد یا تەراش دەسوورێتەوە.

**مەرسەف** (باک.) : مجۆعمە.

**مەرشە** (بل.) : دەمەقاڵە و لێک توند بوون و بە گژ یەکتردا هاتن بە قسە.

**مەرف** (باک.) : مرۆڤ.

**مەرفاتی** (باک.) : خانەوادە.

**مەرقە** (باک.) : پیواز لە ڕوونیدا سوورکردنەوە.

**مەرکانە** (زرا.) : مۆرانەی خووری.

**مەرکاندن** (باک.) : خراپ کردن (بمەرکینە).

**مەرکووت** (باک.) :کوتکی دار.

**مەرکیینی** (باک.) : (بمەرکە) ، توانین، خراپ بوون.

**مەرگ:** ئاکام، مرن، گل، مردن. ــ ی من (بۆ سوێند دەبیّ) .

**مەرگەمووش:** ژەهر.

**مەرگۆنە** (باک.) : چت پێچانەوە و قەدکردن.

**مەرمەڕ:** بەردە مەرمەڕ، خارا، کەلا، هەڵمات، (زاخ.) تەبەل، گوللە (نی چکۆڵە) ، (هەورا.) بییل، کەللا، (هەو. ، خۆ.) کەلابەرد.

**مەرمەڕش:** بلووری، بەلووری، پیرانشای، بالبالی، بلووری، شاخ بزیی.

**مەرمەڕیی** (کە.) : جوورە پارچەییێکی ژنانەیە، کالاّ.

**مەرمەڕیین** (هەورا.) : گەمەیەکی منداڵانەیە بە مەرمەڕ، گولاّن، ماتین، هەڵماتێن.

**مەرمووڵ** (باک.) : برە، دەدانە درێژەکانی بەرازیی.

**مەرمۆتک:** موهلە.

**مەرنای** (هەورا.) : مراندن.

**مەرندای** (هەورا.) : مراندن.

**مەرۆ کردن** (ڕەوا.) : کۆکردنەوە.

**مەرواری:** مرواری.

**مەریالۆ** (هەورا.) : شکان.

**مەرییایی** (هەورا.) : شکاندن.

**مەرییتە:** مەخلووقات. مرۆڤ.

**مەرییکانە** (دەر.) : مۆرانەی زل وەکوتی هەولێرە.

**مەرییوان:** محاڵێکی سەربەخۆیە لە باکووری هەورامانی ئێرانێدا لە مەر خاکی ئەردەلانە. نێوی پیاوییە.

**مەز** (مام.) : لەکن، لەلا. مەز پەزییە: لەکن پەزییە.

**مەزاختن** (باک.) : خراپ کردن (بمەزخە).

**مەزاق:** قەشمەری، گەپ، تییز. ــ پیّ کردن: قەشمەری پیّ کردن.

**مەزە چێژتن:** تام لیّ وەرگرتن، تامداری. تام، خۆش، خۆراکێکە لەگەڵ خواردنەوەی مەی و ئارەقی دەخورێت. بە ــ : بەتام. بیّ ــ : بیّ تام، تامسار، بارهنگف، ڕژیی، کەلە، بیّ مەزەیی: ڕژییتی.

**مەزەدار:** بەتام، خۆش، ڕازراڤ. ــ ی: بەتامی، خۆشی، ڕازراڤی.

**مەزەلۆ** (باک.) : چریشاویی. سمغدار.

**مەزخاندن** (باد.) : چوواندن، گوزەراندن.

**مەزدەسینی:** زەردەشتی.

**مەزرا** (ع.) : کێڵگە.

**مەزراح** (هەو.) : مەرزەق.

**مەزرە:** شبت. شیبووت.

**مەزرەق:** (هەورا.) گل گلوولە، (هەو.) مەزراح. غوزی.

**مەزرەقە** (لک.) : کوللێرە.

**مەزرەقێن** (موک.) : گەمەیەکە بە مەزرەقی دەکریّ.

**مەزرەکە** (باد. ، باک.) : چاپخانە. ڕفێن، (هەورا. ، بالەک.) دە.

**مەزرەکەوان:** چاپگەر، چاپگەری.

**مەزرۆنە** (باک.) : جوورە ترێیەکە.

**مەزریی** (باک.) : عیبرەت ئەنگێز.

**مەزرینگان:** نێوی ئافرەتانە.

**مەزغەنە** (باک.) : خانوویێکە بە دییوودییو بە کریّ بدریّ.

**مەزلۆق** (باک.) : دارێکە.

**مەزن:** سەرۆک، شان بڵند، جێگەبەرز، بڵندجە، گەورە، زل، زەلام، براگەورە، ئاغا، سەرۆک. ــ بوون: گەورەبوون.

**مەزناندن:** مەزن کردن.

**مەزناهی** (باک.) : گەورەیی.

**مەزندە:** مامڵەت. نرخ، مز. ــ کردن: نرخ کردن. تەخمین.

**مەزنی:** گەورەیی، پایەبەرزی، پایەبڵندی، بڵندجهی.

**مەزووک** (فە.) : نەزۆک.

**مەزالک** (کە.) : مێشک، جمجمەی سەری.

**مەزەند** (هەورا.) : تێوەژەنین، تێوەژاندن، لێدان.

**مەزگ** (کە. ، هەورا.) : مێشک، موخ.

**مەزگە** (هەورا.) : کاکڵە گوێز و ئێتر.

**مەزیی** (باد. ، باک.) : مێشک، کیسکا ــ . قالکا ــ : کەللەی سەری، کاژەڵەی سەر.

**مەس** (فە.) : قەڵەو، گۆشتن. سەرخۆش.

**مەسسە** (کە. ، دزە.) : (ڕژ.) بێلەکان، پارچە ئاسنێکی بەقەدەر لەپی دەستی جووتێران گاسنی پیّ خاوێن و سندە گلاّئیشی پیّ دەشێلن بە ئاسنەکەش هەر مەسسە دەڵێن. (ڕژ.) گازران. ئاسنێکە دییواری پیّ کون دەکەن. دییوارسمڕ. دارێکە سەرێکی چتێکی قورس و سەرەکەی

دیکەشی ئاسنێکی تیژی پێوەیە بۆ بیرو چاڵ وگۆڕ قەندنێ. لاپووتە، لاپۆتە، لاپییتە، لاوییتە.

**مەسەف** (باک.): داو، تەڵەی، باڵندان.

**مەست** (باک.): سەرگەرم، سەرخۆش، بان. (باد.) قەلەو، گۆشتن.

**مەستە** (کە.): تیشەیەکە ـــ چتێکە لە برژاندنیدا قاوەی پێ تێک وەردەدرێت. مەست و پلک.

**مەست و پلک** (کە.): مەستە.

**مەستی**: نێوی پیاویە.

**مەسحەفی ڕەش**: یەکێکە لە دوو کتێبەکانی یەزیدییان.

**مەسنا** (باک.): ئەنباز، حەوز، ساردار، قولکەیەکە لەنێو بەردی خارادا هەڵقەندرابێ بۆ ئاوێ.

**مەسێ** (هەو.): خاکەنداز.

**مەسیینە** (هەو.): ئافتاوە.

**مەش** (هەورا.): مێش.

**مەشتەل** (باک.): شەتلی دار. ڕیشە.

**مەشخ**: مەشق.

**مەشرەف**: ئەخلاق، ڕزوو. ـــ خۆش: ڕووخۆش.

**مەشفەن** (باک.): ئەو تەختەی کە مردووی لەسەر دەشۆرێ، تاتەشۆر.

**مەشق**: دەستاو، مەشق بۆ خەت خۆشی، ڕێنەبەر، هەوڕان. ـــ کردن: هۆژاندن. یا بۆ هەرشتێک.

**مەشقەگا**: شوێنی مەشق.

**مەشکە**: هەڵبیز. ـــ ی گاوس: گاوەست، گاوەش. ـــ ی شیریی: شیارۆک.

**مەشکەدڕە**: کوللەیەکی شین و زگ زلە، (شا.) نزار. (لک.) قجییلە.

**مەشکەڕان**: قوڵتەی ڕان، شلکەی ڕان.

**مەشکەدۆ** (موک.): جوورە مارێکە، قولەوەییاب.

**مەشکەژاندن**: بە دوو کەسان دەست و پێی یەکێک بگرن و وەکوو مەشکە بیژێنن.

**مەشکەژەنە**: ـــ پێ کردن: لێدان، تێ هەڵدان، مەشکەژێن.

**مەشکەژەنی**: ئابڕووبردنە.

**مەشکەرەک** (فە.): مەشکەدڕە، جوورە کوللەیەکە.

**مەشکەلاق** (خۆ.): بەلەک.

**مەشکەلوولاک** (خۆ.): بەلەک.

**مەشکنژیی** (باک.): قابقاب ساز.

**مەشکۆڵە** (کە.، جاف.): مەشکەی چکۆڵە، دۆدانەی دۆ.

**مەشکیین** (باک.): ئەوەی بۆنی مسکی لێ بێ، گوێدێر، ئاسوودە.

**مەشلوول** (باک.): هەرییری دۆشاوی.

**مەشۆ**: ڕفتن، دریین، ڕێگاکردنەوەی ئاو.

**مەشوولە** (هەورا.): مێشوولەی گەورە.

**مەشیا**: هەردەبێ.

**مەشیی** (هەورا.): مێش، (هەو.) مەعمەعانێ، گەمەیەکی منداڵانەیە.

**مەشیینی** (باک.): لە جنسی مەڕیی.

**مەغلا** (کە.): مۆڵگە.

**مەغەڵ** (باک.): جێگایەکە بە شەو ئاژاڵ تێدا ڕابوێرن.

**مەغز** (فە.): مێشک، ناوک، مەخز. ـــ ی بادام: ناوکە باوی.

**مەغموون**: مەغبوون. ـــ کردن: غوبن.

**مەفار** (هەورا.): بە هێنان و بردنی قولێنگ دەڵێن لەکاتی لێدانیدا.

**مەفرەق**: کانزایەکە مس و قەلایی حەوجۆشی لێ دروست دەکەن.*

**مەفشەن** (باک.): تەختی جەنازە لەسەر شوشتن، تاتەشۆر، مەشفەن.

**مەفلاندن** (باک.): تێ هەڵسوون، ڕەنگ کردن.

**مەفلیین** (باک.): بەقلە، تێ هەڵسووڕان، ڕەنگ کران.

**مەقار** (کە.): کۆخەی ماڵاتە (ئەخۆشی).

**مەقاش** (خۆ.): ماشە.

**مەقالە** (کە.): مەقەلێ.

**مەقام**: گۆرانی، مقام، قام.

**مەقامبێژ**: گۆرانی بێژ.

**مەقەستە**: شەڕ نەخێویی سوواران بە دووی یەکدا بە چەشنی مقەستی دەورە فیتەی دەدەن.

**مەقەسۆک** (باک.): باڵندەیەکە.

**مەقەش** (کە.): ماشە.

**مەقەلێ**: مەقەڵە، گەرمەمیین، مەقالە، مەنقەل.

**مەقیێز** (زا.): مێوژ.

**مەکات** (کە.): باج، پیتاک.

**مەکاتگر**: جابی.

**مەکارە**: مکارە. ـــ ی دارتاشان. (کە.) کاروان، (ئەردە.) غەرغەرە. ـــ چی (کە.): کاروانچی.

**مەکۆ** (کۆ.، پژ.): کەمیین، هەشارگە، شاردنەوە، جێگای دزان خۆیان یا چتەکانیانی تێدا دەشارنەوە. چوونە ناو ـــ: خۆشاردنەوە. مرازێکە لە کەرستەی جۆلایی، مەکۆک، مکۆک.

**مەکۆک**: مرازێکی جۆلاییە، مەکۆ، (خۆ.، کۆ.) شەپۆیە، (کۆ.) شەپۆل، مکۆک.

**مەکی** (هەورا.): خووێ.

**مەگەز** (شو.): مێش. ـــ ی گەزۆ: مێشی گەزۆ.

**مەگەز خۆرەکان**: ئەوانەی مەگەزان دەخۆن.

**مەگەر**: ئایا.

**مەگەسە**: نەخۆشییێکی چاوانە، (فە.) مێش.

**مەگەن** (باک.): ناوچە.

**مەگەنی ئەزمێن**: ئەستێرەی قوتبە، دەغدان، هێتم.

**مەگرتی** (باک.): گریمان.

**مەگروون**: مەسحەفی ڕەش، مەسحەفی ڕۆژ. گەردوون.

**مەگریی چەنی** (هەورا.): مقەست، (هەورا.) دووارد، (باک.) تۆرتان، ئلیپەندک.

**مەگنات:** مەگناتیس.

**مەگنی:** ئەستێرەی قوبلە.

**مەگیرانە:** مەگیرانی.

**مەگیرانی:** بیبزیی، بێزوو، (ڕۆژ.) بێزە، حەز کردنی ئافرەتە لە هەندێک خواردەمەنی لەکاتی ئاوسییدا.

**مەل** (هەم.، هەو.): باڵندە، باڵدار.

**مەلا:** زانای ئایین، (یەز.) کۆچک، کۆچەک. (باک.) ـــ تی: مەلایەتی. ـــ زادە: ئەوەی مەلا. ـــ ژن: ژنی مەلا. ـــ یەتی: (باک.) مەلاتی.

**مەلاتەقتەقێن:** گەمەیەکی منداڵانە.

**مەلاشوو:** میچی سەرەوەی دەمییە، گۆشەک، شیلکە سەرە لەسەر نێوچاوانە، مەلاژوو، مەلاژگە (نەو.)، ئاسمانەی دەم، ئارییننگ، (هەورا.) ئاسمانەو دەمی، (باد.) پانک.

**مەلاژە** (بار.، موک.): مەلاشوو. (موک.) ئالوو.

**مەلاژوو:** ئالوو، مەلاشوو. ـــ کەفتی: ئالوودار.

**مەلاس** (دزە.): کەمیین، پەنا، پەناگە، بۆسە، کەلێن، پەیجۆر، خۆ لە ـــ نان: خۆ لە بۆسە نان، خۆ پەنهان کردن.

**مەلاسە** (کە.): زار ئاوەڵە کردن لەبەر پشمین.

**مەلاشە** (کە.): بلێسە.

**مەڵاشوو:** مەلاشوو.

**مەلاک** (هەو.، دزە.): کەوچک، لە (ملعقە) وە هاتووە.

**مەلە:** ئاژنی، ئاڤژەنی، سۆبایی. ـــ کردن: ئاژنی کردن، سۆبایی کردن، تێ هەڵاتن، سۆبەیی.

**مەلەڤان:** مەلەوان، ئاڤژەن، ئاوباز. ـــ ی: مەلەوانی، ئاوبازی.

**مەلەچەک:** ماستاوکردن، مەلەچەکی، ڕیایی کردن.

**مەلەس** (باک.): جوورە پارچە (قوماش) ێکە.

**مەلەنگ:** سەرخۆش، سەکران.

**مەلەوان:** ئاڤژەن، ئاوباز. ـــ ی: ئاوبازی، مەلەڤانی.

**مەلەوەر** (زەن.): باڵندە، باڵدار.

**مەلەیی** (سوو.): مەلەوان.

**مەلحەم:** هەتوان، چرک.

**مەلبەن** (ڕۆژ.): مەڵبەند، دیار، هەوار، نیشتمان، زێد.

**مەڵبەند:** نیشتمان، دیار، (باک.) ئەوەی لە ملەوە دەپێچرێ. ملبەند، ملپێچ.

**مەلخاندن** (باک.): شاردنەوە، پەنهان کردن.

**مەلخیین** (باک.): خۆشاردنەوە (بمەلخە).

**مەلساندن** (باک.): خۆ کرووژم هەڵێنان، خۆ کۆکردنەوە و مات کردن لە جێگایەکی.

**مەلسیین** (باک.): ووردبوون، ووردو خاش بوون.

**مەلکەب** (باک.): سەوەتە، قەرتاڵە.

**مەلکەڕیی:** تیرەیەکە لە کوردەکانی ئێرانی لە هۆزی سویسنی.

**مەلکەس** (ما.، عەنتاب): گەسک.

**مەلکەسەن** (ڕەوا.): کرمێکی تووکن و ڕەشە ئەونی لەسەر گیایان دەکات. پەیدا بوونی وی نیشانەی بەهارێیە دوایە دەبێتە پەپوولە. زیپکەییکە، (موک.) تەلەمژیران.

**مەلغە:** لەهاز.

**مەڵکانە** (کە.): شاکاشی، کاشی گڵی ئی زۆر گەورە بۆ ماستی بەقاڵان.

**مەلەل** (کە.): پارچەپارچەی زەوی.

**مەڵۆ** (هەورا.): تا، گیشە بەڵاّن چکۆڵەترە تەنها ٢ ـــ ٤ باقەیە لەسەر یەک دادەنرێ. (کە.، بابا.) باقەی گیاو دەغڵە کە بە دەستەوەبێ بەڵاّن کە دانرا دەبێتە باقە. (هەو.) قولە دەخڵێکی درواوەیە کە سەپان پڕ بە قۆڵی دەیدورێتەوە و یەکە یەکە لەشوێنی خۆیان بە جێیان دێڵێ و زۆرترین ژنان هەڵی دەگرنەوە و دەیکەنە گیشە.

**مەڵوەن:** مەڵوەند، نیشتمان.

**مەڵوەند:** مەڵوەن، نیشتمان.

**مەڵۆتکە:** وێنەی قۆنداخە، منداڵی ساوایە بە پێچراوەوەیی، (هەو.) قۆنداخە. باڵندەی چکۆڵە.

**مەلۆک** (ڕەوا.): پیاوێکی ژنانییە کە لەناو ماڵی خۆیدا یا لە ماڵی یەکێکی تردا کاری ژنانە بکات.

**مەڵۆسی:** چەل و مەل، پیلۆس.

**مەڵۆیان:** قات و قڕی نێو مەلۆیان.

**مەڵوو** (دەر.): باقەی دەخڵ و گیا.

**مەلووچک:** چۆلەکە.

**مەلووک** (باک.): قولێک گوڵەگەنم.

**مەڵۆنێر** (کە.): گیشەکەر.

**مەلوولاو** (بابا.): جوورە هەویرێکی جۆ و گەنمییە پەلخوری دەکەن و دەیدەن بە ماڵاتانی نەخۆش یا تازە زاو.

**مەلهێب** (باک.): شەنە.

**مەلیچک** (لو.، فە.): چۆلەکە.

**مەلیک شا:** تیرەیەکە لە فەیلی.

**مەم** (باد.، هەورا.): مەمک.

**مەمە** (هەورا.): مک. دایەن.

**مەمک:** (هەورا.) دەم. ـــ ی مەمکی: چچک، چیچییلە، چۆرت، مەمێ، یزی، پێسییر، مەم. (باک.) بەروو، لە ـــ کردنەوە: ئەوەیە دایک چیتر مەمک نەداتە منداڵەکەی، بە زۆری لە تەمەنی دوو ساڵەی منداڵەکە دەبێ.

**مەمکۆڵە:** مەمکی گچکەی ژنان.

**مەمکە** (هەو.): جێگای کەلای مێوییە.

**مەمکەفەرەنگی:** مەمکی دەستکرد.

**مەمە:** گۆیکە خڕەکەی سەر مەمکی.

**مەمرەمەژی:** کولەمەرگی، بۆ خواردنی کەم بەکاردەبرێ.

**مەمکەکێزانە:** گیایەکی هاوینییە، درواوییە، گەلاکانی وە چەقۆی دەچی کەناریان بە دروو ڕازاوەتەوە پاییزان پشیلەی بابردەی لێ پەیدا دەبێ.

**مەندیوە** (هەورا.): مانەوە.

**مامنا** (موک.): ئەمەز، تومەڵێ.

**مەمۆتک** (شن.): گیایەکە خونچەکەی لەپێش پشکوتندا لەنێو سرکەدا پەروەردەو بە ترشیاتەوە دەخورێ.

**مەمۆڵە**: مەمک.

**مەنەی** (هەورا.): مان.

**مەمووز** (باک.): ئەو ئاسنەیە لە پشتی پانیەی چەکمەی دەکرێت بۆ زرینگەو بۆ لە وولاخ دانییە.

**مەم وزین**: دوو دڵداری بە نێوبانگ بوونە، چیرۆکەکەیان بە بەند دەگوترێ و بە (مەمی ئالان) ناسراوە، ئەحمەدی خانی (مەم وزین)ی کردوە بە داستان. یەکێکە لە (١٢) بەندە گۆرانییە کۆنەکان.

**مەموەند**: هۆزێکی ٢٠ ــ ٣٠ دێ دەبێ کەوتۆتە ڕۆژئاوای باکووری هەولێرێوە.

**مەمێ** (هەورا.): مەمک.

**مەمیلە**: تووکە حەرامە.

**مەن** (باک.، کە.): مەند، ڕاوەستاو، هێمن. هێدی. باتمان.

**مەنە**: ماوە.

**مەنتەشە**: لاولاوەی دەرک و پەنجەرە.

**مەنن**: مەند.

**مەنجەڵ** (باک.) سووکرە، ئەلبەکی، بەرۆش. (دەر.) خەزان. (زەن.، جەب.) پاتی، (سۆر.) مەنجەڵۆک.

**مەنجەڵی گەورە**: (دەر.) خەزان، (جا.) تییان.

**مەنجەڵۆک** (سۆ.): مەنجەڵ.

**مەنجەنیق**: کوورەی ئاوریین.

**مەنجۆخ**: گومبەت.

**مەند** (باک.): ڕاوەستاو. گیایەکە. مەن. هێمن، حەلیم. ئاوی مەندو ڕاوەستاو. مرۆی بە سەبرو تەحەممول و پشوودرێژ.

**مەندال** (باک.): مندال.

**مەندە** (کۆ.): پاداشت، مکافات، ئەمەک، دفنان، سزا.

**مەندەبۆر**: مرۆی چرووک و بێ خێرو مرو مۆچ. (خۆ.) مەندەموور.

**مەندەبوور** (ڕەوا.، بابا.): ڕەزییل، پەت، قاڕنان، چرووک، قرچۆک، لاهییر، فیلەتەن، بە قەڵافەتی پێ نەچوو و زل و ناهەموار دەڵێن. لاسار: دەست بەندیانە دێن و دەچن سەروو یاسەمەن

یا حەلقەیانە سۆفی مل خوارو مەندەموور (نالی)

**مەندەموور**: چاولەدوو، لاسار، مەندەبوور، قاڕنان.

**مەندیی**: تیرەکە لە کوردەکانی ئێرانی.

**مەندۆکە** (موک.): مەندی.

**مەندوونە** (شار.): خاکەندازەی بەر کوورەیە.

**مەندی** (فە.): ماندوو.

**مەندێ**: بەندۆکە، مەندۆکە(شار.) بەندەکە، مەنی، گیایەکە گەلای وورده ئاوەکەی بۆزگ ئێشە باشەو خۆشی بە گەرمی لەسەر مووسڵدان دادەنرێ، بەندک.

**مەندیل**: شاش، شووشە، مێزەرو پێچی مەلایانە، شاشک، مێزەر، ــ بەسەر: ئەوەی مەندیلی لەسەربێ.

**مەندیلەمەلا**: کۆکلە.

**مەندیلان** (کۆ.): کێوی، پنچکە گیایەکە زۆر بڵند نابێ و گەڵای وەئەی کوڕادەی دەچی نێزیکی گەزێک بڵندە لەسەری گوڵێکی سووری نێو سپی دەردەکات.

**مەندیین** (باک.): بەهێز، بونیە قەڵەو و کورت و تێکسمراو، قوڵەبنە.

**مەندیینە** (باک.): هێز، قووەت،

**مەنقەڵی**: مەقەڵی. مەنگەل.

**مەنگەل**: مەقەڵی.

**مەنگەلە** (پژ.): درهم (٥٠ فلس).

**مەنگەنە**: پێچ، جەرو مەنگەنە، گیرە.

**مەنگەنەبادەر**: ئەوەی مەنگەنەی پێ با دەدرێ تا شەتەک بدرێ.

**مەنگور**: خێڵی گەورەی کوردە.

**مەنگوڵە**: گوڵنگە ئەستوورەکانی شەدەو ئی دیکە.

**مەنێ**: مەندێ (گیایەکە).

**مەنی**: ئاوێکە مرۆیان لەکاتی ڕەحەت بوونێدا لە سیرەتیان دێ.

**مەواتن**: دەمکۆت.

**مەوەرد**: گێڕانەوە، گەڕاندنەوە.

**مەوەزۆ** (کەل.): مەوەرد، گەڕاندنەوە، جوولە پێدان، گێڕانەوە.

**مەوج** (هەو.): بەتانیە، جاجمێکە لە دەزووی سپی لۆکەی دەکرێ. پەتوو، جاجم.

**مەودا** (موک.): ماودا، مەودا، ــ دان: مەیدان دان، دەمی چەقۆو تیغان کە ڕاست و تیژبێ، نووکی نێزەو ئیدییە، تیژبی، تیغ.

**مەومەو** (فە.): میاوەمیاوی پشیلە.

**مەووز** (کۆ.): مێش، مەگەس.

**مەهان** (فە.): ماین.

**مەهار**: لمبۆز، جلەو، کون لە کەپوو کردن و بەن یا چتێکی تێ هەڵکێشان.

**مەویج** (فە.): مێووژ.

**مەوییز** (لو.، باک.): مێووژ.

**مەوییزەسەرە** (کە.، ڕۆژ.): جووره مارێکی باریک و سەرڕەشە.

**مەهرووک** (باک.): گە.

**مەهسەر** (باک.): کۆل، حەوز.

**مەهسەک** (باک.): تەوەرداس.

**مەە** (کە.، زا.، بابا.): مەڕ، مانگی (٣٠) ڕۆژی، مانگی ئاسمان.

**مەها** (کە.): مێیینەی هەموو جنسێکە.

**مەهر** (باک.): مارە، لخوە ــ کرن: لە خۆ مارەکردن.

**مەهرکی** (باک.): خوەرستی، زەوتەلی.

**مەهریی** (باک.): گە.

**مەهدەر** (باک.): تکا، پاڕانەوە، مەهدەرکرن.

**مەهدەرڤان** (باک.): شەفیع، تکاکار. ـــ ی: تکاکاری، پاڕانەوە، پاڕیینەوە.

**مەهفوور** (باک.): مافوورە. ـــ کار: ـــ ساز، ـــ کاری: ـــ سازی.

**مەهوەش**: بۆ یاران بەکاردەبرێ، وەک مانگ، ڕەنگی مانگ.

**مەهک** (باک.): مانگانە، بێ نوێژی، کنج.

**مەهمەهۆک** (باک.): گیایەکە.

**مەهمەل** (باک.): بەرهەڵبێنە، پێشگیرە. پەیین و کاو کۆتێکە لەبەر پێیان بلاو دەکرێتەوە.

**مەهنەک** (باک.): ماینێکە زین بکرێ. ماینی زینی.

**مەهوو** (باک.): بەرازی مێی کیوییە.

**مەهوار** (باک.): تەحەمول، تەرز.

**مەهوان** (باک.): میوان.

**مەهووژ** (باک.): مێوژ.

**مەهی** (باک.): مانگی، مانگانە، شیردان.

**مەهیر** (باک.): چێشتێکە لە ماست و دانەوێڵە، دۆ کولیو.

**مەهین** (باک.): ماین. ـــ یی: جووانوەماین.

**مەی** (باک.، زەن.): شەراب، بادە شیبرە، مەیدەر: ساقی، (باک.) مەر، مەی.

**مەیاڤ** (باک.): ڕۆیینی ئاو بە هێدی، ڕەوانی ئاو بە هێدی.

**مەیانە** (بل.): خەڵووزی بەرد، (کە.) نێوەڕاست.

**مەیانەیی**: یەکسەرە.

**مەیاندن**: ـــ ی خوێن: کەسداندن.

**مەیە** (باک.): ئێستری مێ.

**مەیەس** (زەن.): مێش.

**مەیەڵە**: مایێچە، لێ مەگەڕێ.

**مەیبانگ** (باک.): مەیخانە.

**مەیبەنگ**: مەیبانگ.

**مەیتەر**: سەیز، خزمەتکاری چارەوێ (ئەسپ و ماین و ئێستر).

**مەیتەرڤان** (باد.): مەیتەر.

**مەیخانە**: مەیستان، مەیبانگ، مەیگەرین.

**مەیخۆر**: شەرابخۆر. ـــ یی: شەرابخۆریی.

**مەیخۆش**: مێخۆش، مزر.

**مەیدان**: ـــ ی ئەسپ غاردانێ، دەرفەت، ماوە. گۆڕەپانێکی کەمێک گەورەیە کە دەورەی دوکان بێ. گۆڕێکی زۆر پانە، گۆڕەپان، کۆڕژ، ناوکۆ.

**مەیداندار**: پاڵەوان. ـــ ی: مەیدانخواستن.

**مەیداندان**: لەدوودان، خستنەسەر، بە دەمەوەدان، شەلەگەدان، ڕێدان.

**مەیزە**: تەماشاکردن.

**مەیستان**: مەیخانە.

**مەیزاندن**: تەماشا کردن (بمەیزە).

**مەیزیین**: تەماشا کردن.

**مەیساز**: مەیگەر.

**مەیکوت** (باک.): کوتک، چەکوچی دار.

**مەیگەر**: مەیساز.

**مەیگەرین** (باک.): مەیخانە.

**مەیموون**: (باد.) شەمور، مەیمیینک.

**مەیمیینک** (باک.): مەیموون.

**مەیمان**: میوان.

**مەیمانخانە**: میوانخانە.

**مەیمانی**: زیافەت.

**مەینەت**: خەم، خەفەت، ڕەنج، کڵۆڵی، بەدبەختی.

**مەیۆ** (زەن.): دێ، دێت.

**مەییر** (باک.): بۆ یەکێکی نەدیبوە، شۆرباوی ماستی، قامکە سووتەڵە.

**مەییک** (باک.): محایانە، ژنانییلە، نەرم.

**مەیین**: توند بوونەوەی ڕۆنی شل و پیسو و خوێن. توند بوونەوەی شیری کولاو و هەوێن کراو. بەستن، قەرسیین، گرسان. ـــ ی خووێن: کەسدیین.

**مت** (سل.): بێ دەنگ، خامۆش. (شا.) مروش. گووێز یا مەرمەڕ یا مازووکە دادەکرێن بۆ لێ دانێ (لەگەمەدا). (باک.) سەکۆ.

**متمق**: حس، هەست، ووس، ـــ لە خۆ بڕیین: پرزە لە خۆ بڕیین، هەست لە خۆ بڕیین، ـــ ی ناکا: ناجوولێ و چناڵێ.

**متکنە** (کە.): ئیتولکە.

**متۆ**: ماڵی، ڕاهاتوو، کەوی، بۆ مرۆ و باڵندەو ئاژاڵ و وولاخان دەبێ.

**متووربە**: پەیوەند.

**متێل** (باک.): دوروشەگ.

**متوومووورە**: منە، مییرە، تەتە (زاراوەی منداڵانە).

**متوومووورگ**: متوومووروو.

**مجەچەمان** (کە.): (هەو.) مەحچەچە، خرنووکی ووشک.

**مجەور** (کە.): مجێور، مزدەور.

**مجری**: سندووقی چکۆڵە.

**مجیای** (هەورا.): ڕژان.

**مجۆعەمە**: سیینی، فەرخسینی، لەنگەری، مەرسەف، (بۆتا.) بەرگەشن، ـــ ی دار: تەبەق، خووانە، خووانچە.

**مجێور**: مجاور.

**مچ** (باد.، کە.، ڕۆژ.): قوڕولییم کە زۆر پێ پەست کرابێ چەسپ دەبێ و چتی دەگرێ دەڵێن مچ بووە، لیچق، چەسپ، ساردا و، ـــ کردن: داخستن، پێوەدان.

**مچاندن** (باک.): قوچاندنی دەست (بمچیینە).

**مچکاندن** (باک.): ووشک کردن (بمچکیینە)، وشک بوون.

**مچ و مۆڕ**: مشومۆڕ، ڕووترش، مۆن.

**مچییرە** (کە.): قەرچەکردنی ماکەر.

**مشکیین** (باک.): ووشک بوون (بمچکە).

**مجوورک:** مووچرک.

**مشومۆڕ:** مۆن، ڕووترش.

**محال:** هەرێم.

**محامچینین** (موک.): (کۆ.) ماچەنکێ، جووره قومارێکی جگێنییه به پتەی لێ دەدەن.

**محەجەری:** تارمە، سینج.

**مخابین:** مرخابین، حەیف، داخەکەم.

**مخانه:** تیپیرەیەکە لە بلباسان.

**مختی** (باک.): بێستان، جۆگەی فرمێسک.

**مخەمخ:** دەنگی کەپۆی پیرانە لەکاتی خواردندا.

**مخمخاندن** (باک.): شکاندن، هاڕین، فلیقاندنەوە (بمخمخینە).

**مخمخک** (باک.): بێستانی کاڵەک و شووتی، جۆگەی فرمێسک.

**مخوالی** (باک.): پوورزا (کوڕو کچ).

**مخێن** (باک.): نەرەنەڕی شێر.

**مدبەق:** قوون کوانی. ئاشپەزخانە. شوێنی چێشت و نان لێنان.

**مدران** (زا.): ڕاوەستان.

**مدرای** (هەورا.): ڕاوەستان. ڕاوەستاون.

**مدرنای:** پشوودرێژی.

**مدۆ** (ژا.): دان، دادان.

**مر** (کە.): تەن، لەش، بەدەن، باڵندە. (جا.) مریشک.

**مڕ:** ملاژ، چرکیدار، مۆرانەی خوری و ئیتر، تێر (بۆ مالاّت بەکاردێ)، ـــ بوون: مرەوە بوون.

**مرار** (باک.): مندار، لاشە، ـــ بوون. ـــ ی: مرواری.

**مرازسازی:** هونەری میکانیک.

**مـراز:** ئـارەزوو، مـراد. ئـامراز، پارچەیەکـە لـە کەرەسـتەکانی جوتی و دارتاشی و هەموو پیشەیەک. ـــ ی کارەبایی: کەرەستەی کارەبایی.

**مراندن:** پێراهێنان، سلارکردن، کوشتن.

**مڕاندن:** مرانن، کوشـتن، مرانگـیـن، مـەرنای، (لـو.) مـەرنـدای، مرێـن، نەبووکردن، تووناکردن، تووناوتوون بردن. سەگ کەبیانی ببینێ کەڵبەکانی لەسەر یەکتریی دادەنێ و دەمرێـنێ یا کەنێسکی بە دەمـەوە بێ و سـەگی دیکە بۆی بێ. ـــ ی پشیلە: خرەخر.

**مرانگین:** مراندن.

**مـراوی:** مـەراقی، ـــ مـێ: بـۆرە باڵندەیـەکی ئـاوداره کێـوی و کـەوی و ئاویشی هەیە گەردنی دیغێکی سپی یا ڕەشی تێدایە، (زەن.) مامراوی.

**مرایی** (کە.): چاپلووسی، ڕواڵەت، ڕووپامایی.

**مڕە** (کە.): مرەمر، ـــ ی پشیلە: خرەخر، مۆرانەی گلیییـە وەکـوو نـی هەولێرێ. گیوە، (کە.) مۆرەقە.

**مرەبا:** چرک.

**مڕەمڕ:** ـــ کـردن: مرمرین، مـرە، نێـوی دەنگـی سـەگ و پشـیلە لـەکاتی شەڕیدا کە ددان لەسەر یەک دادەنێن و دەمرێنن.

**مرتال** (باک.): مـەرتال، مەتاڵ.

**مرتالەک** (باک.): جووره ماسییەکە.

**مرتەمرت:** پرتەپرتی ژنان.

**مرخ** (فە.): مریشک. مەیل، تەماع.

**مرتۆخە** (باد.): مێوانی. تەنها ڕۆن و ئاوو ئاردەو توندە.

**مرخە:** پشکە، پر، هەڵامەتی ئاژاڵانـە چڵمی زۆر لـە کـەپۆی دێ و تەنگـە نەفەسی دەبێت. گیای پسکە کە ووشک بوو یا شوولکی داری (تێردو)ی لـەملی گرن چادەبێتـەوە. نوێل، باریی، ئاسن یا دارێکـە چـتی پـێ بلند دەکرێ و پێ هەڵدەقەنرێ. دەرخزە.

**مرخەمرخ:** پخپخ.

**مرخن** (دزە.): خار، کار، نخار.

**مرخێش:** خیشە.

**مرخێش مرخێش:** خێشەخێش.

**مرچ** (باک.): مڵچەی ماچ کردن، دەنگی ماچ کردن.

**مرچەمرچ:** بروانە: مڵچەمڵچ.

**مرچ** (شن.): مۆن، گرژ.

**مرچقاندن** (باک.): وورد و خاش کردن، هـاڕیـن، چیـین و لـوچ کـردن، فلیقاندنەوە، (بمرچقیینە).

**مرچقیین** (باک.): ووردوخاش بوون، فلیقانەوە، جیق دەرهاتن.

**مرخاو:** مرخە، دەنگی گەروو یا کەپۆیە.

**مردە خۆر** (هەو.): سووت خۆر.

**مـردار** (فـە.): وولاّخ و ئـاژاڵی منـدار. (شـا.، هـەورا.، بـاک.، کـە.) سەگ، سپلۆت، سپلەوت، ـــ بوون: مندار، پیس. چرووک، چاولەدوو.

**مرداو:** زەلکاو. زۆنگاو.

**مردارەبەر** (بل.): تووکی بەر. پارچە دەغڵێکی بچکۆلەیە.

**مردارەخۆر:** ئەوەی گۆشتی مردار دەخوا.

**مردارسەنگ:** دەرمانێکە، مردار سنج.

**مرداری** (کۆ.): تووێژ، بەری مرۆیان.

**مردەڵە:** مردۆخ، مردۆخە.

**مردک** (باک.): تووێخ، تووێژ، پێست و تێکوڵی زۆر، تەنک و ناسک.

**مردگ** (کە.): لاواز، لەڕ.

**مردم و سووتام:** هەوڵ و تەقەلایەکی بێ پایانم دا.

**مردن:** گیاندان، تێداچوون، لەنێو چوون، نـەبوون، دەبـەرمردن: بـە قوربـان بوون، پێراهاتن، پێراهێنـان، سلاربوونەوە، بەلاداهاتن، بـەلاچێ بـوون، تووناو توون چوون، توون بەتوون چوون، پیپپ بردنەوە.

**مردوخ:** مردۆخە، مردەگ، پیاو وە مردووی دەچووێنرێ.

**مردۆخە:** مردەڵە، بە یەکێک دەوترێ کە وە مردووان بچێ.

**مردوو:** مریی، مردایی، سووتوو، بـەرەش داکـەوتن، تارمـایی مـردووان: مێردەزمە، خێو، بە ـــ هەڵکەوتن: سەردووڵکەوتن.

**مردیاک** (باک.): تەختە.

**مردی:** مردوو.

**مردووشۆر:** مردیشۆر.

**مرشکی** (باک.): جووره بووزوێکه.

**مرق** (بابا.): قرم. نەڕە.

**مرقەمرقی کەروێشکی**: واقین.

**مرقه** (ڕۆژ.): پرمه، دەنگی پرمەپرمی تەگەیه لە حەلی بزن بە تەگەدا.

**مرقـەمرق**: کووفکـووف، پرمـەپرم، بۆقـاندن، مـرق و هـێڕ، بڵـمـبڵم، فیکفیک.

**مرقن** (کە.): قەڵەو و زل و ناڵەبار، ڕەزاگران.

**مرق وهۆر** (کە.): مرقەمرق.

**مرک** (لو.): ئانیشک، (باک.) هەلاّمەت.

**مرڕک** (شن.، گەر.): مۆرانه، (بار.) خۆرک.

**مرکانه** (گەر.): مۆرانەی زل.

**مرڕکه** (ڕەوا.، هەو.): مۆرکەی خوریی و لبادی.

**مرکێش**: مرخێش.

**مرکێش مرکێش**: مرخێش مرخێش.

**مرمرک** (باک.): مێشی چکۆڵه.

**مرگ**: شەیتان.

**مرمریین** (باک.): مرەمرە کردن (بڕمڕه).

**مرن** (باک.): مردن، مەرگ.

**مرناو**: میاوەمیاوی پشیلان.

**مروا**: گەش بینی، ڕەش بینی.

**مروەت**: پیاوەتی.

**مرۆ**: ئادەم، زەلام، پیاو، مـرۆڤ، (هەورا.) هـەرمێ، مـروێ (بۆ گەلـه) هەرمێیان.

**مرواری**: مراری، مەرواری، نێوی ئافرەتانه.

**مرۆچه** (کە.): مێرووله.

**مرۆر**: گیایەکی دڕاوییه و گوڵی زەردە، گیایەکە لەنێو گەغاندا شین دەبـێ جووره دانێکی ڕەنگ سـەوز دێنێ لـەنێو دەغلانـدا بـێ تـاڵی دەکـات. زیبوان.

**مرۆشیان**: قاڵ، جەنجاڵ، گوڕ تێ کەوتن.

**مرۆی** (فه.): هەرچی.

**مرۆک**: مرۆڤ.

**مرۆڤ**: مرۆ، پیاو، مەردوم، مێرهۆڤ، مەردوم، مرۆک، مەرف.

**مرۆکیوییله** (هەورا.): هەرمێ کێویله.

**مرۆڤانی** (باک.): خانەواده، مرۆڤاتی.

**مرۆڤـۆک** (بـاک.): پیـاوێکی گچکـەو بـێ تـین و لاوازو پـەرپووت. زیندەوارێکه وەمرۆی دەچێ بەڵاّن زەردە کە نێزیکی شانەی هەنگی بکـەون تێکی دەدەن.

**مـرڕوو** (شار.، کۆ.): هەنگـەخۆره. مەرییکانـه، باڵندەیـەکی چکۆڵەیـه مێش هەنگوینان دەخوا گوایه کرمێکه هەر لەنێو هێلانەی هـەنگێدا پـەیدا دەبێ و فەرخەکانیان دەخوا.

**مرۆیەتی**: مروەتی، پیاوەتی.

**مرووچ** (باک.): مرومۆچ، ڕووگرژ، مرووز.

**مرووز**: مرومووچ، مرومشت.

**مرووموچ**: مۆن، گرژ، مرچ، ڕووگرژ.

**مرووموش**: کەمکەمه لێرەو لەوێ خواردن، مرومووس.

**مرومووشکەر** (بابا.، هەو.): پلەندەر، لاپرسەنی، مووشەک، نەرەفه.

**مریاوەتی** (فه.): پیاوەتی.

**مرییچه** (فه.): مێروو.

**مریشکاوی**: قەلەمراوی.

**مریکار** (باک.): ئارەزوومەند. ـــ یی (باک.): ئارەزوومەندی.

**مرێن** (باک.): مراندن، لەسەره خۆ دەنگ لێوه هاتن.

**مری**: مردوو.

**مریشک**: مریی ئیشکانێ، (دەر.، کە.) مامر، کەرییک، کرک، کەرگه، مر، داربۆق.

**مریچلی** (هەورا.): چۆلەکه، کێشکه، بە هـەموو باڵندەیـەکی چکۆڵـه دەڵێن.

**مریشکەچینی**: چیین و ماچیین، مامره چیینی.

**مریشکەڕەشه** (بابا.): باڵندەیەکه لە پڕشۆڵە گەورەتره.

**مریشکەکێوی**: (باک.) پیریل.

**مریشکۆ** (باک.): مریشکی کێوی و جەنگەلانّه.

**مریشۆر** (باک.): مردووشۆر.

**مز** (باد.): مزر، مـەیخۆش، کرێژک، مووچـه، بـەها، بایی، کرێ، نرخ، جەمەکه، مەزنده، ماف، قورقوشم، خوردەک، زرییچ، دەم و لووت سپی.

**مزاخه** (باک.): ئاندین، تەبەکی هەوییر، سندووقی نان تێ نانێ.

**مزاش**: مزه، ئاشانه.

**مزاندن**: بە هێواشی و کزی قسەکردن.

**مزانی** (هەورا.): مزگێنی.

**مزه**: مـزاش، ـــ ی ئاشـی. (هـەورا.) مـزەو ئاسـاویی. (بابـا.) تـاقی کردنەوەیه بـۆ زانینی پایەی ڕزن و خووێ و ئیدی. (ڕۆژ.) بە هێواشی و کزی قسەکردن، نووزه.

**مزەمزه**: نووزەنووز.

**مزەیت** (باک.): مشتاخ.

**مزەوەر**: مووچەخۆر، چیرەخۆر.

**مزەوره** (ڕەوا.، دەر.): مزراوییلکه.

**مزەئاساوی**: مزه.

**مزبەر**: مجەوەر.

**مزدەوەر**: بڕوانه: مزەوەر.

**مزدەر**: مووچەخۆر.

**مزدان**: تۆڵەی چاکه.

**مزر**: مەیخۆش، مز، (باک.) جار.

**مزراوییلکه**: حەفت ترنگێنه، حەوت ترنگێنه، مرارۆکـه، مـزەوره، (ڕۆژ.) جلبڕ، چێشتێکی ترشەو هێلکەشی تێ دەکرێ.

**مزره:** ئێستری نێر.

**مزرۆکە:** مزراوییلکە.

**مزگانی:** مزگێنی.

**مزگەری:** کاری مز.

**مزگەفت** (هەورا. ، زەن. ): مزگەوت.

**مزگەوت:** (هەورا. ، زەن. ) مزگی، (هەو. ، باد. ) مزگەفت، مالاّخودێ.

**مزگت:** مزگەوت.

**مزگێنی:** (هەورا. ) مزانی، مژدە، (دزە. ) مژدانە، دڵڕوونی، مزگێنی دان: دڵڕوون کردنەوە.

**مزگی** (زەن. ، هەورا. ): مزگەوت.

**مزیار:** کرێکار.

**مزێج:** مەگێیرانی. مز.

**مژ:** ـــ ی کێوان: تەپ و مژ، (بار. ) مژەکوڕ، نەفەس، ـــ لە جگارەدان: نەفەس لە جگارەدان.

**مـــژان:** مـــژران. مژانکـــە، باسـکێش، دارە درێژەکـــەی جوتییـــە، دارە درێژەکەی جەنجەڕییە کە وولاّخ بە هۆیەوە جەنجەڕ ڕادەکێشێ.

**مژانە** (لاجان): گەلەی جووتی.

**مژاندن** (باک. ): مێژاندن، شیر بە فەرخەدان، بمژیینە.

**مژانکە:** باسکێش.

**مژە:** برژانگ.

**مژەر:** ئەوەی دەمژێ.

**مژەکوڕ** (بار. ): تەپ و مژی کێوو دەشتانە.

**مژتن:** مژیای، مێژەکردن، مژیین.

**مژدانە:** مزگێنی.

**مژدە:** مزگێنی، نێوی ئافرەتانە، ـــ دەر: مزگێنی دەر.

**مژران:** مژان.

**مژراو:** شتێ کە مشتبیان.

**مژک** (باک. ): تەپ و مژێکی سووک.

**مژگوول** (باک. ): مژۆڵ.

**مژمژە** (خۆ. ): مێشمیژک، میس میس، گوڵێکی زەردی کێوییـــە ئـــی شینیشـی هەیـە لەبـەر شـیرینی منـدالاّن دەیمژن، مژمـژۆک، شـیرمژە، میژمیژۆک. (خۆ. ) جووره قەیسییێکە، (باد. ) قەیسی تـەڕ، زەردەڵـوو، پەپوولەییێکی شین و لمۆز درێژە لیکی گولاّن دەمژێ.

**مژمژۆک** (باک. ): مژمژە، گیایەکە، مێوی هەنگوینن.

**مژمژۆڕ** (کە. ): مۆن، گرژ.

**مـژۆک:** ووشـک کـەرەوە، قاقـەزی ووشـک کـەرەوە، زوانـک، هـەڵمژ، (باک. ) نەرم.

**مژۆڵ:** مژگوول، بژانک، (زا. ) مژۆلانـک، مژوولـک، (بـار. ) بژوولکـە، مووژانـک، مژییلانـک، برژانـک، (هـەورا. ) برژانگـێ، بژانـک، مێژییلانک، (شا. ) بژۆل، (سور. ) بژێلک، (ڕەوا. ) بژوولـک، بشـکۆل، مووژەلانک.

**مژوولانگ** (زا. ): مژۆڵ.

**مژوولک** (بار. ): مژۆڵ.

**مژوولی** (جز. ): قسەکردن، ئاخۆتن، ووتووێژکردن.

**مژیای** (هەورا. ): مژیین، مژتن.

**مژی بن ئاگر** (کە. ): زییلەمۆ.

**مژییلانک** (باد. ): مژۆڵ.

**مژیین:** مژیای، مژتن، مێتن.

**مس:** مز. (هەو. ) کوللەیەکە لـە کورتانـەی گـەورەترە دەست بـە ڕۆیشـتن دەکات سەربالّی دەردەکات.

**مست:** مشت، گۆڵـم، (مـوک. ، بـاک. ) چنـگ، بۆقـک، لـە ـــ ی کوشـتن. ڕاپەلقیین، پڕ بە دەستێکی، قەڤد، مستێک گەنم، لاویچێک مسـتی پـێ دەڵێن. دەستی قوچـاو. ـــ لـێدان: بەدەسـتی قوچـاو لـێدان، مسـتەکۆڵە: بەمستی لێدان.

**مستەکۆڵە:** مشتەکۆڵە، (فە. ) گورمچە.

**مست لێدانێ** (هەو. ): گەمەیەکی مندالاّنەیە.

**مستی** (باک. ): تەلەسم.

**مستی پشتی** (هەو. ): گەمـەیەکە.

**مسری** (مـوک. ، هـەو. ): جـووره ماسـییەکە. لـەڕ، لاواز، بـێ تـووک، دالّگۆشت.

**مسک:** گوڵێکە شین و بێ بۆنە بەلاّن گەلاّکانی بۆنداره.

**مسکە** (دەر. ): دەسک.

**مسگەر:** کەسێکە قاپ و مـەنجەڵی مـس دروست بکـات. ـــ ی : کـاری مس.

**مسمەدە** (باک. ): گێژ، دووزمان، ئاوی بزرکایە.

**مشـار:** منشـار، هـەرڕە، هیـیزار، بـاگۆزە، برهـەک، (بـاک. ) برهۆک. بـرڕەک، (بـاک. ) خیـیزار. (بـاد. ) دێراوی بێستان و ئیدییکە. ـــ خانە: برڕەکخانە.

مشار

**مشان** (دەر. ): باسکێش.

**مشـە** (بـاد. ، مـوک. ، بـاک. ، کـە. ): زۆر، گـەلێک، زەبـەند. مشـەمش: خشە، دەنگێکە لەکاتی نووستن و بێداریتیشدا لە کەپۆی مرۆ دێت.

**مشەخت** (باک. ): لانەواز، ڕەهەند، پەنابردن، زاریی.

**مشەمش:** ـــ ی مرۆ و گامێش.

**مشەوشی** (باک. ): چێشتێکە لـە وورده نیسکی لـێ دەنرێ.

**مشت** (کە. ، لـو. ): پڕ بەدەست، پڕ تا لێواری قـاپ و ئیدی. ـــ و مـاڵ کردن: ڕەوارتن، هوولووکرن.

**مشت، مشتاخ:** لەنێو باخـاندا جێگایەکـە تـرێ و هـەنجیرو هـەرمێی لـەبـەر تاوێ لـەسەر ووشک دەکەنەوە. کۆتان. بزەیت.

**مشتە** (کە. ، هەو. ): دەسـتەک ئـی پینـە چییانـە. نیشانە، ـــ لـێ گـرتن: نیشـانە لـێ گـرتـن. (هـەورا. ) دەستەمسـتە، دەستەمشـتە، ئـەو جێگـا دەستەیەکە بە پاشبارەی جووتێوەیە.

**مشتەکۆڵە:** مشتەکۆڵی. . .

**مشتۆ:** دەسک.

**مشت و كوشت:** گەمەیەكە یەكێک دەخەوێ و یەكێكیش دەبێتە پاسەوان و كۆمەڵێكیش دەست دەكەنە لێدانی.

**مشت ومر:** پییلە، كێشە، بەربەرەكانی، مووشت ومر: مرومشت. وە ـــ كەوتن: تێک گیران.

**مشك:** (هەورا.) مڵە، مووش، میش. مسک. (هەورا.) قەزوانی وورد.

**مشكەكۆر** (باک.): مشكی كوێر، (كە.) مشكەكوێرە.

**مشكەكوێر:** مشكەكوێرە، مشكەكۆر، خڵت، سستێڵۆک، كەرەكۆر.

**مشكڵۆزمە:** قەرزدار.

**مشكی:** ڕەش، خۆڵەمێش. (هەو.، كە.، هەورا.) شەدە.

**مشكێن:** چتێكی بۆنخۆشەو لە خوێنی ناوكی جۆرە ئاسكێک پەیدا دەبێ.

**مشمشاندن** (باک.): مشەمش كردن، بە تاریكیدا جوولان.

**مشوار:** بێ مشوار: بێ بڕ، بێ فرشک، بێ ـــ ی: بێ بڕی، بێ فرشكی، لاهەڵپچڕاو.

**مشوەش** (باک.): نیسک.

**مشوور:** (زەن.) پاشار، (كە.) باشار، بە ـــ: بە باشار، بە پاشار، بە تەگبیر، سامان. غەمخۆریی، غەمخواریی، غەمخۆر، غەمخوار.

**مش ومۆڕ:** مچ ومۆڕ.

**مشن:** بە مشەمش.

**مشهەت** (باک.): غەمخۆر، دەربەست، دەربەند.

**مشێو** (هەورا.): دەبێ. (فە.) چڵم.

**مفتێ خۆر:** بەخۆڕا خواردن.

**مفت:** خۆڕایی.

**مفتە:** پێشمەرگە، هەیتە، (كە.) مفرەدی.

**مفرەدی:** لەكاتی محەمەد پاشای گەورەی ڕەواندزێدا بە عەسكەر كوتراوە. (باک.): ژاندارمە، كێشكچی.

**مفسک** (باک.): پارزن، پلاوپەز.

**مقرۆ** (باک.): شەل، كەسێكە یەكێک لە ئەندامەكانی سەقەت بووبێ.

**مق:** هەوای كەپۆ.

**مقەست:** دووارد، مەگرییچەنی، قۆرتان، جاوبڕ.

**مقەبا:** مقەوا.

**مقەوا:** دوویردک.

**مقام** (كە.): گەرەک، فەرز. جوورێكە لە گۆرانی.

**مقەو:** هەڵامەت و كۆخەی ماڵاتانە بە تایبەتی یەكسم و گوێدرێژان و ئێستران دەیگرن چڵمێكی زۆری لە لووتی دێ و جێگای ئالووی هەڵدایسێ كای كۆنی بۆ زەرد دەكەن وەسەری دەخەن چا دەبێتەوە.

**مقۆمقۆ** (بابا.): دەنگەدەنگ.

**مكارە** (بابا.): ئەسكەنە، مرازێكی دارتاشییە بەلێدان چتی دەكوتی، مەكارەی نەجاری، ـــ ی دەم خڕ: ـــ ی دەو خڕ، ئەو مكارەیە كونی خڕی گچكەی پێ گەورە دەكرێتەوە.

**مكەون** (باک.): بە پەلە، بە هەشتاوی.

**مكۆ** (ڕۆژ.): كوتكی جل شووشتنییە، مشوونک. حەشارگە، كەلێن، ئەو سەنگەرانەیە كە دز بە شەو خۆی تێ حەشار دەدات.

**مكولۆک** (باک.): هاندان.

**مكۆک** (كە.): مرازێكی جۆلاییە، مەكووک، شەپۆپە.

**مگێز** (هەو.، خۆ.): مەیل، هەوەس، تامەزرۆیی، ئیشتییا، بێز، قێز. ئارەزوو، دڵخواز. ـــ دار: تامەزرۆ. ـــ ی: تامەزرۆیی.

**مل** (باک.): گەرد، تەپە. ئەستۆ. ـــ ی ئەستوور: گێپەڕە، خینگە، گنێخە. ـــ پان: بێن فرە، پشوودرێژ. (بار.، باد.) شان. لە ـــ ی مەن: لەئەستۆی مەن، ـــ لەبەر ـــ نان: بەرەبەرەكانی كردن. زۆرەوانی گرتن، پێكەزتن. ـــ لێ نان: دەست بە ئیش كردن. ـــ لەبەر نان: دەست پێ كردن. ـــ بە كوێن (موک.): كوین لەبەر. ـــ نەدان: یاخی بوون. (باک.) لا، بەش، شان، هۆزێكی كوردە.

**مڵ** (بابا.): تۆزێكی وورده بە هەر شتێكەوە بنووسێ بە ئەرک لێی دەبێتەوە.

**مڵاشک:** مەلازۆ.

**مڵاڵە** (باک.): دەستە، بەستە، چەكمە، مارنەگەز.

**مڵانخۆلی:** یانی (مالخولیا)، خاوەند خولیا، خەمخۆر، خەمخوار، سەوداسەر، گراو، دڵدار.

**ملە:** لە كەل چكۆڵە ترە. گردێكی درێژو نزمەو ڕاكشاوە، كەلک، كەل، پاڵ، باسک، بستو، بڵندایێكە، كە لە پشت ویشەوە بڵندایێكی لەوی بەرزتر هەبێت، هۆی نێوبرانی ئەوەیە خۆی ملەو سەریشی هەیە كە لەوی بڵندترە. بەش. ـــ قووتەی مریشک: بە ملی سەر بڕاوی مریشک و كەڵەبابی دەڵێن. ڕقەبەری، بەربەرەكانێ. ـــ خڕە (هەورا.): گەرووخڕە، ـــ كێو: زنجیرەی كێو.

**مڵە** (هەو.، ڕەوا.، خۆ.): جۆبركە، قوزبركە، گوڵبڕ، وڕڵە، هووڵە، وورە، (هەورا.) مشک.

**ملەک:** یاڵی شێرییە، ئەو تووكەیە بەسەر ملی شێرییەوەیە.

**مڵەما** (هەورا.): باوێژیی نێوزگ. لە لای مەردۆخی: دەستەملان.

**ملەوانە:** ملوانە.

**مل بەرز:** كەڵە مەشكێن.

**ملچە:** ملچ. مرچە، دەنگی دەمییە لەكاتی ماچ و خواردنێدا.

**ملچەملچ:** ملچ. مرچەمرچ.

**مل بەند:** مشلە.

**ملپێچ:** گەردن پێچ، مەڵبەند، ملوانە، گەردن بەند، شال گەردن، (باک.) ئلێمی.

**ملت:** لیبک، تڵتە.

**ملچاندن:** مژین.

**ملچێوک** (كە.): كلچێوک.

**ملخوار:** زارخوار.

**ملڕانن** (كە.): دەرچوونی گوڵی گەنم و جۆ لە ساقەكەی.

**مل شكان:** شكانی مل، كەوتنە گیرو گرفتێكی گەورە.

**مل کەچ:** ڕام، فەرمانبەر، گوێ دێر، ــ کردن: فەرمانبەریی کردن، سەردانان.

**مل کسک** (باک.): گەسک.

**مل کەچی:** ڕاگومکێ.

**مل کس** (باک.): گەسک، مل کسک.

**مل کورت:** خنک.

**ملک** (باک.): سەرەوخوار، سەرەوژێر، نشێو.

**مڵک:** موڵک.

**مل گر** (باک.): لاگر، تەرەفدار.

**مل گریی:** لاگریی.

**مل ملانە** (کە.): بەربەرەکانێ، ڕقەبەری، ــ کردن: ڕکابەری کردن.

**ملکاندن** (شا.): مژین، مژتن، بیملکێنە: بیمژە.

**ملۆ** (هەورا.): ئەو ئامێرە دەغڵە دروراوانەیە بە جوایەزی پارچەپارچە لەسەر زەوی دادەنرێن.

**ملوانە:** بەرمۆر، تۆق، مل پێچ، ملەوانە.

**ملوەند:** ملوانە.

**ملوانک** (کە.، دەر.): قەلادە.

**ملوانکە** (دەر.): بەرموور، ملوێنکە.

**ملۆزم:** زۆردار، کەڵەگا، زاڵ.

**ملوێچک** (هەم.): باڵندەیەکە تووکی بڵندی لەسەر سەرییە، (بابا.) کلاوکورە.

**ملوومۆ** (خۆ.): مرووموووشکار.

**ملووموش:** مل ومۆ.

**ملویی** (فە.): گەردن بەند، بەرموور.

**ملهوڕ** (کە.): مرۆی زرتەبۆز و مل ئەستوور، کەڵە مەشکێن، لەندەهۆر. یاخی. ــ یی: زرتەبۆزیی، لەندەهۆری، یاخییەتی، بە ملهوڕی کارەکەی کرد.

**ملهێبۆک** (باک.): شەنە.

**ملهێبووک** (باک.): شەنەی درێنەیە، (باک.) ملهێبۆک.

**ملێ ملێ:** خۆ پەرستی.

**ملێب** (باک.): شەنەی جووتێران.

**ملێبا** (باک.): جووتێر لە کارکردندا لە سێیەمین جاری حاسیلاتدا.

**ملێباتی:** ملێباتی.

**ملێبایی:** ملێباتی.

**ملیچلێ** (هەورا.): چۆلەکە، کێشکە، بە هەموو باڵندەی چکۆلە دەڵێن.

**ملیچک:** چۆلەکە.

**ملێبۆک** (باک.): شەنەی چکۆلەی جووتێری.

**ملیوان** (کە.): ملوان، ئێخەی دەوروبەری گەردنی کراسییە.

**من** (ڕەوا.): ئەمن. بەش، منامن: بەشی من. مۆ، می، ئەز، یۆنە. لە باکووردا تەنیا بۆ تێپەر بەکاردەبرێ: من گوت، من گرت، من دکەم، من ددەم. (شەم.) تەنیا لەو جوورە جێیانەی بەکار دەبەن. من گۆت، من دیت.

**منا** (کە.): لۆمە، بە چاودادانەوە.

**منارە:** دروسکراوی زۆر قووچ لە مزگەوت بۆ بانگدەر. *

**منالّ:** مندالّ. (کە.) ــ ی: مندالّی.

**منەکار:** منەتکار، خستنە ژێربار بەرامبەر بە چاکەیەک.

**منە:** منگە. (موک.) پەوولّ (زاراوەی مندالّانە). مترو موورو، تەتە. (کە.) هەست، هۆش. (جا.) بەسەر کردنەوە، (زەن.) پێ کەوتن، گەڕان، بەدی کردن، وێکەوتن. (هەورا.) تاقی کردنەوە، جیاوازی پێ کردن، گەڕان و پشکنین، چاودێری کردن. داوێن.

**منەمن:** کەسێکە نەیەوێ کارێکی بکا بە ــ دەکات، بە منگەمنگ و پرتەپرت.

**منەیی:** گەڕان بە دوای شتێکدا بەپەنهانی. پشکنین.

**منجە** (کە.): منگە.

**منجەمنج** (کۆ.): منگەمنگ، پرتەپرت. لەکاتی کردنی کارێکی بە دڵ نەکردندا.

**مندار:** مرار، لاشە، هەرمێین، پیس، گلاو، سوێکە، قنورک، کۆرپە، زراسک، ساکا، کۆرپەلە.

**منجڕ** (هەو.): منگن، ڕق ئەستوور، سەرڕەق، کەسێکە بە پرتەپرت و بۆڵەبۆڵ بێ و قسەی لە خەڵکی خۆش نەیەت، ــ ی: ڕقەبەری، سەرڕەقی، لاساریی.

**مندالّ:** خێزان. مالّ ومندالّ، کولّفەت. ــ ی شیرە خۆرە: مندالّی ساوا هێشتا لە شیر نەکرابێتەوە. ــ مردن: زگ سووتان، جەرگ بڕان، جەرگ هەڵقرچان. ــ مردوو: زگ سووتاو. سەخلّ، مەندال، (هەورا.) زارۆڵە. (بۆتا.) زارۆک، بچووک، ئاییل، پز، چرک، زارۆ، پچووک، چێلی، منالّ، چووچک، بەچکە.

**مندالّا:** ــ دار، بێ ــ: بێ دووایی، بێ دوندان، بێ شوێن.

**مندالّباز:** بەچەراز، بەچەباز.

**مندالّبەر:** ژنی مندالّدارە، ژنێکە مندالّی گچکەی هەبێت.

**مندالّیتی:** بچووکاهی، بچووکێتی، زارۆیی.

**مندالّدان:** ئاوالّدان، سلی، پزدان. ئاڤلدانک.

**مندالّی:** منالّی.

**منۆ** (کە.): سەگی فەرهەنگی، منۆخ.

**منۆغ** (کە.): منۆخ.

**منگاندن:** منگەمنگ کردن.

**منگە:** منە، منجە، بە کەپۆ ئاخافتن.

**منگەمنگ:** پرتەپرت و بۆڵەبۆڵێکی لەکاتی نا بەدڵی و ناخۆشیدا دەکوترێ. منەمن، منجەمنج. ــ کردن: منگاندن.

**منگن:** بە منگەمنگ، گن، منجڕ، (هەو.) خمخم.

**منمنۆ** (هەورا.): دەنوێنێ.

**منمنییک** (باک.): پەپوولە.

**منۆخ:** سست، تەمبەلّ.

**منێک** (هەو.): کرولۆت.

**منێ منێ**: خۆویستی، خۆپەرستی.

**مۆ** (هەورا.، کۆ.): من، ئەمن.

**مۆتە**: کابووس، کامووسک، (کۆ.) کامووس، دێوەزمە، مۆتەکە، دێوەزمۆکە، مێردەزمووکە، گرانایییەکە لە خەوێدا سواری پیاوی دەبێ.

**مۆتەکە**: مۆتە.

**مۆتک** (خۆ.، ڕەوا.): پێچکە دارێکە گەڵای وەنی بی دەچێ بەڵان چکۆڵەترو جوانترە و هەمیشە شینە.

**مۆتی** (باک): دژشاو.

**مۆچ** (ڕۆژ.): ماچ، ماچ ومووچ.

**مۆچک** (باک.): مووچک.

**مۆچکار**: مۆچیار. ئامۆژگاریکەر.

**مۆچیاریی** (شار.): ئامۆژگاریی.

**مۆخ** (هەورا.): مێشک، مێشکێکە لەناو لوولاک و ئی دی دابێ تەنها لەسەردا نەبێ.

**مۆدە** (شن.): شاکاشی. (فە.) جوانوو.

**مۆدنە**: دارجغارە، دارجخارە، (هەورا.) دەمنە. بەردەقک، دارک.

**مۆدیینکە**: کەناری لای پێکێشانی مۆدنەیە کە کارەبا یا چتێکی دی تێ خرابێ.

مۆر

**مۆر**: ــ هەڵقەندن. ڕیحانە. پارچە مسێکی دارێژاوە. بە تایبەتی بۆ ئەوەی نێوی کەسێکی لەسەر هەڵقەنرێ، بە هەڵقەنراویش هەر ــ ی پێ دەڵێن. ــ کردن: قۆڵ کێشان، باوەڕ بە ڕاستی کەسێک کردن. نیشانە. شینێکی تۆخە لەنێوانی شین و کەسکدا. بیکەر(باک.) دارێکی درێژ کە بەچەند پارچە ببڕێتەوە ــ ی پێ دەڵێن. مێشوولەی گەورە، تەپۆ. ــ شکاندن: سەر دەق شکاندن. ــ نەشکای: سەردەق نەشکای.

**مۆڕ**: دوورەپەکی، مۆن، تیکوورک. قەلس، مێڕبوونەوە، چاومۆڕکردنەوە، قەلس بوونەوە: بەڕقەوە تەماشاکردن، بە قەلسی تەماشاکردن، تیپکوورک کردن، چاو هەڵگێڕانەوە.

**مۆرانە**: گلی، ــ ی گەورە وەکوو ئی هەولێر، مەریکانە، (گەر.) مرک، ــ ی خوری: سوس، (بار.) خوورک. خیرک، مرکە، مۆرکە، گییوە، جییوە، زیندەوار، جروجانەوەر. مۆرانەی زەوی و خاکی.

**مۆران** (باک.): تەپ ومژ.

**مۆرە**: قوڕەپەست، تەفە.

**مۆرەسەنگ** (کە.): مۆرە بووتا: بووعە، (موک.) بستە. پارچەیەکە لە قەدی دار، (کە.) مدار، ئەو ئاسنەیە کە میلی بەرداشی لەسەر دەسووڕێ، بەردەمۆر. دیوار تەنها بە قوڕ دروست کردن. مۆرە.

**مۆرەقە** (کە.): مۆرانە.

**مۆرت** (کە.): داری مرتک.

**مۆرتک** (کە.): موور و پۆرت، دارێکە هەمیشە شینە بە کفن وەردەکرێ تا درەنگ بڕزێ، بۆنی خۆشە چولوەکەشی بۆ کەپرە شینە بەکاردێ. دارێکە لە پزیشکیدا بەکاردەبرێ. موورد.

**مۆرد**: مۆرتک، دارێکی هەمیشە سەوزە.

**مۆرک** (باک.): مووروو.

**مۆرکە**: مۆرانە.

**مۆروو**: مۆری. ــ چی: سازبەند، ــ چییەتی: سازبەندیی.

**مۆریانە**: ژەنگ، ئەسپێ و ڕشک و کێچە، زیندەوار، (ڕۆژ.) ئەبوێد.

**مۆڕین** (باک.): نەڕە، ــ دان: نەڕاندن.

**مۆڕینان**: زیڕەی شێر.

**مۆری** (باک.): مۆروو. سێرە (گرێیەکەی سەر لوولەی تفەنگییە). (خۆ.) گیایەکە مەترێک بڵند دەبێ و زۆر شلکەو لاسکی دەخورێ.

**مۆرییلە** (کە.): مێروولە.

**مۆز**: کەرمۆز. مێشەکەر، مێشەکەرانە. ــ کردن: مێشە.

**مۆزانی** (باک.): تفەنگی بە بەردی.

**مۆزەخانە**: شوێنێکە کەل و پەل و چتی کۆن ودێرین ونایابی تێدا نمایش دەکرێ.

**مۆزسۆز** (باک.): ژەنگسوورە.

**مۆزقرتک** (باک.): زەرگەتە.

**مۆزک** (باک.): پارگوێری نێرەمێیە.

**مۆزییقەو بالەبان**: مۆسیقا.

**مۆزێ** (هەو.): حەز لە ژنان کردن، وە دووی ژنان کەوتن.

**مۆزە مۆز** (کە.): سەرەتای دڵداری.

**مۆشەنە** (باک.): خەنجەر.

**مۆژییک** (خۆ.): پەلک ووردەو خڕە گوڵی شین و بۆنی گرانە تا پشتێندی بڵند دەبێ.

**مۆفرک** (باک.): گە.

**مۆژیار**: ئامۆژگار. ــ ی: ئامۆژگاری.

**مۆفک** (باک.): گە، ستوونی پشتی.

**مۆکەر** (زا.): ماکەر.

**مۆکەل**: فرۆشگا.

**مۆڵ** (هەورا.): بە ئارامی کۆبوونەوە، کۆ، گرد، بۆ ڕەشە وولاخان. ــ بوون: کۆبوونەوە. مۆلکە، جێگایەکە وولاخی لێ مۆڵ دەکرێ لەنیوەڕۆی ڕۆژانی گەرمدا. زۆر، مشە.

**مۆلان** (بۆتا.): تەمێکی ڕەنگ شینە لە دوورەوە لە ئەوال و شووێنە قوولەکانی ناو چیا بڵندەکاندا دەبینرێ.

**مۆلە** (باک.): ماڵە، بڕوانە: ماڵە، ماڵە کردن.

**مۆڵەت**: موهلەت، ــ دان: ڕێگادان.

**مۆلک** (برا.): خۆڵەمێش، مشکی.

**مۆڵگە**: ــ ی کێویان، نووڕینگ، میل، پشتەڕۆژ، مۆڵ، هەفسی، مەغلە.

**مۆلەق**: واتە چاوزەق وەستان و نەقوچان. گلێنە لە ئاودا جوولان (چاو بە ــ ڕاوەستان).

**مۆم** (بابا.): شەمی سووتانێ، شەم.

**مۆمدان**: شوێنی مۆم دانان.

مۆم

**مۆمیی** (باک.): مۆمیین.

**مۆمیین** (باک.): مێزەر، پێچی سەری.

**مۆمیا:** مومیا، دەرمانی لەش مردوو ڕاگرتن.*

**مۆن:** گرژ، مرچ، مۆڕ، ڕووگرژ، ڕووترش، مژمۆڕ، تووش، دژ، کڤن، دوومێرەکی، ڕووتاڵ، مچ ومۆڕ، مش ومۆڕ، مڕومۆچ، ـــ ی: گرژی، ڕووگرژی، مچ ومۆڕی.

**مۆنج:** ـــ کردن: قێز لێ بوونەوە.

**مۆنگ** (هەورا.، کۆ.): مانگ.

**مۆنگلە** (هەورا.): مانگ، مۆنگلە.

**موتربە:** (هولی پەیوەند) نی داران.

**موتلی:** موتووی، منداڵ یا بێچوە ئاژاڵێکە گیرۆدە و هۆگری یەکێکی بووبێ.

**موو:** هەڤداک، پۆڕ، پۆڕت، پوورت، مووی مرۆیان، تووک وپۆپ. قژ. ـــ ی بزن و ئیتر بۆ ڕەشماڵان بەکاردەبرێ. ـــ ی دەماخی، پیلۆس. ـــ ی ڕاست بۆوە، ـــ ڕاست بوونەوە. دەردە پیسە، دەردێکی زۆر ئێشدارە لە قامکان پتر پەیدا دەبێ کە دەر بوو نێرتکەکەی دەردەهێنرێ چاک دەبێتەوە.

**مووار:** ڕیخۆڵەی پڕ لە ڕیخ و ئیتر، گیپەی ڕیخۆڵە.

**مووایی:** بەمور.

**موبالات:** بێ ـــ: دڵڕەبەن.

**مووەتان** (باک.): موکێش.

**مووتابچی** (کە.): مووی تاوچی، موفرۆش، کارگەی خەرار دروست کردن.

**مووتلوە** (دەر.): ڕلوکە (هێلکە).

**مووتلوچی** (کە.): موفرۆش.

**مووت** (ڕەوا.): ووشیار، ئاگادار، گێم موتن: گوێم قوتن، ووشیارم.

**مووتک:** موورتک. دارێکە هەمیشە شینە گەڵای وە ئی هەناری دەچی بەڵان ووردترە، بۆنی خۆشە، بە کفنی مردووان وەردەکرێ تا درەنگ بڕزێ، شوولەکانی دەکرێتە سەبەتە، بەری وەکوو ترێی ڕەش وایە بەڵان ووردە و دەخورێ و تامی خۆشە. ئاوی گەڵاکانی بکوڵێ و بخورێ بۆ هێزی چیکڵدان و بۆ ڕاگرتنی ڕەوانی زۆر باشە.

**موتووی:** بڕوانە: موتلی.

**مووچ:** ماچ ومووچ. (باک.) کەوگیر. قوونێر، دوومەڵ. (دزە.): گوێ ـــ کردنەوە، گوێ قووت و جووت کردن.

**مووچلخ:** پرچی دەستکرد، باڕوکە. (کە.) لوولاک.

**مووچاندن:** چەماندنەوە.

**مووچاندنەوە:** خوارکردنەوە.

**مووچە:** دەقن، جیرە، بەرات، کرێ، (باک.) جەمەکە. دەبرە. زەویی خاوەند خێریی، زەوییێکە ڕەنێو هێنرابێ، زەوییەکە کرداری لێ برابێتەوە. (جا.) جومگە، ـــ ی دەست: جومگەی دەست. زەوی چاندن.

**مووچەبەر:** شەریک.

**مووچەخۆر:** چیرەخۆر، مزدەوەر. ـــ ی: جیرەخۆری. مووچەمووچ (بەشبەشی).

**مووچەنان** (هەورا.، جا.): نردووەنان، بابۆڵە.

**مووچرک:** مووچوورک، مچوورک، تەزوو، مووچنگ.

**مووچک** (باک.): مووچنگ، مووکێش، ماشەیەکە مووی پێدەکێشرێ. (ڕەوا.) مووی بەرو بن هەنگڵ.

**مووچنگ** (باک.): مووکێش.

**مووچنگۆک** (باک.): مووکێشی چکۆڵە.

**مووچوورک:** مووچرک.

**مووچینەوە:** نوشتانەوە.

**مووچیاری** (سن.): ئامۆژگاری.

**مووکابین:** حەیف، مخابن.

**موور** (هەورا.): ڕیک، ئیشارە، نیشانە.

**موورەخەی سلێمان:** بڕبڕەی پشت.

**موورەزاری** (شا.): پیپلەوار، پێڵەوار.

**موورتک:** پارچەداری ئەستووری نەقەڵشراوە بۆ سووتاندن. بڕوانە: موورتک. میمتک.

**مووخۆرکە:** واز، برینێکی پیس و کڕێژاویە لەسەر پەیدا دەبێ زووی چار نەکرێ دەبێتە کەچەڵی.

**موورگ** (جا.): موورروو.

**موور** (هە.): بزنێکە گوێیەکانی کورت و گچکەن، (باک.) گێژ.

**موورەڕەش** (هە.): بزنێکە گوێی کورت و زۆر گچکەیەو لەشی ڕەشە.

**موورەسپی** (هە.): بزنێکە گوێی کورت و زۆر گچکەیە و لەشی سپییە.

**موورەسۆر** (هە.): بزنێکە گوێی کورت و زۆر گچکەیەو لەشی سۆرە.

**موورەشین** (هە.): بزنێکە گوێی کورت و زۆر گچکەیەو لەشی شینە.

**موورەکاڵ** (هە.): بزنێکە گوێی کورت و زۆر گچکەیەوگوێ و ڕوومەتی سوورەو لەشی ڕەشە.

**مووردار** (دەر.): موورتکە.

**موورروو:** مۆرک، (گەر.) بێرگ، (جا.) موورگ، مێروو. ـــ ی گەی پەنجەو ئیتر.

**موورگ:** موورروو.

**مووروەو کەرانە:** مووررووی کەرانە.

**موورووێن** (موک.): (هەو.) ئینجیانی، جوورە گەمەییێکە بە موورروان دەکرێ.

**موورێو** (هەورا.): دەخۆم.

**مووریی** (باک.): مێروو. ـــ ی ڕەشک: مووروەڕەشە، ـــ ی زەرک: موورووە زەردە.

**موزدەکی:** پەیڕەوی موزدەک ناوی ئایینێکە، کە موزدەک لە سەردەمی قوبادی پادشای ساسانیدا دەری خستبوو، بنچینەی وی لەسەر هاوبەشی ماڵ وەکو یەکی مرۆڤان وابوو (شیوعییەت)، قوبادیش بوو بە هاوباوەڕی بەڵان گەورەکانی لە ئێرانێ لێیان خۆش نەهات و لە ئەنجامدا بە پێچەوانەی جوولانەوە لە سەرەتای سەڵتەنەتی خوسرەوی ئەنوشێروان بە چەند هەزار کەسەوە کوژرا.

**مووزه** (دزه.): مرۆ، یا وولاّخی پەرپووت، نابووت. ترێی ترشاویشه بۆ دۆشاو.

**مووزەرد:** پۆرزەرد.

**مووزییک:** گیایەکە پەلکی خڕو گچکەیە.

**مووژانگ** (باک.): مژۆڵ.

**مووژەلانگ** (باک.): مرۆڵ.

**موژدە:** مزگێنی.

**مووژوولانگ** (باد.): مژۆڵ.

**مووسابایی:** بەزەیی.

**مووسایی:** جوولەکە، ئەوەی لەسەر دینی مووسابێ.

**مووسڵدان:** لای خوارەوەی زگییە بەلای ڕانانەوە.

**مووسڵی:** گیایەکە لە کێوان شین دەبێ لە ترشیاتی دەکرێ. (شن.) زییسک.

**مووش:** شارێکە لە کوردستانی تورکیا. (شار.) مت. (کۆ.) گوێزیا مەرمەڕ یا مازوو لە مەرمەڕێندا دایدەکەن بۆ لێدانێ. (کە.، ڕۆژ.) مشک.

**مووشانە** (کۆ.): ماتێن.

**مووشدەمە** (بابا.، کە.): کوورەی ئاور دەمانێ، ئەو هەمبانەیە کە بە کوورەی ئاگردەماندنێوەیە، کوورەی ئاور دەماندنییە. هەمبانە دەف.

**مووشەک** (کە.): پلەندەر، لاپرەسەنگ، مرومووشکەر، تەرەفە.

**مووشەکان** (هەو.): ئاشەوان.

**مووکار** (باک.): گوێزان، تیغی تراشی.

**مووکری:** جوورە هەڵپەڕینێکە.

**مووشن** (لک.): کوتن، گۆتن.

**مووغەیر** (دەر.): ئاورگ.

**مووغبەرە:** گۆڕستان. پارچە گۆڕستانێکە بە تایبەتی نی ماڵێکی بێ.

**مووفرۆش:** موتابچی، موتاوچی.

**مووکردن:** تیژیی.

**مووکریان:** ناوچەیەکی کوردستانە لە ئێران.

**مووکرز:** توورە.

**مووشێن** (بابا.): ماتێن، کەلایانێ.

**مووکێش:** مووچک، مووچنگ، مووەنان. (کۆ.) چلوورە.

**مووم** (باک.): مێوی هەنگوین. مێوی سووتاندن.

**موومدانک:** شەمدان.

**موونج** (باک.): بێزوبۆ، ـــ ژک لەسەرێ تەیە: نەحلەت، بێ بەش لەبەزەیی.

**مووهیر** (باک.): مۆر.

**مووییلە:** موورۆکە لە باڵندەو ڕوەکدا.

**موویین:** تووکاریی.

**مە** (باک.): مەری سێ ساڵانەیە.

**مهانە** (باک.): بەهانە.

**مهرانی** (باک.): جوورە هەرمێیەکە.

**مهرک** (باک.): گە.

**مهرگان:** میهرگان، جێژنێکە شەوورۆژی لەپاییزدا بەرامبەرە وەکو نەورۆز لە بەهارێدا.

**مهرفان** (باک.): میهرەبان. ـــ ی: میهرەبانی.

**مهفان** (باک.): میوان.

**مهی** (هەر.): مەڕ، یەکسەرە مەڕ.

**میسک:** میشک.

**میشک:** میسک.

**مێ:** مێیینە. (جا.) ما، (جا.، هەورا.) مێچکە. (جا.، ڕۆژ.) مەڕ، واژیی نێر.

**میاواندن:** میاوەکردن.

**میەن:** کوتن.

**میە** (فە.): مەڕ.

**میاومیاو:** نەونەو.

**مێباز:** ئەوەی بە دوای ژناندا بگەڕێ. ـــ ی: بە دوای ژناندا گەڕان.

**میەومیەو** (شو.): میاوەمیاوی پشیلە.

**مێتن** (باک.): مژین (مێژە)، شیرخواردن.

**مێتوولە:** مێتوولکە.

**میتوولکە** (باک.): بەنگۆڵە، (دەر.) میتکە، (دزە.) بانگۆڵە، بانگە، میتوولە، متکە. (خۆ.) بووانگ.

**مێجبێتی** (باک.): بێش، بێشە، باربوو.

**مێچکە** (هەورا.، جا.): مێیینەی گچکە.

**مێچکەمێچکە:** جوولانەوەی ژنانیە.

**مێخ:** سینگ.

**مێخەک:** قەنەفل.

**مێخەکە:** بزمارە لە پێ دێ، بە تیژ یا بەردی جەهەنەم چارە دەکرێ.

**مێخەکبەند:** خەناوکە، بەرموورێکە لە مێخەک و مەرجان ژنان لە ملی دەکەن.

**مێخ سکە** (کە.): گوڵمیخ (ئی ئاسن).

**مێخ سندان** (هەورا.): سندانی ئاسنگران.

**مێخوەش** (باک.): مەیخۆش.

**مێدرەو** (ڕەوا.): دیواری حەوش و ئیدیی کە داری دارەڕایەی دەخرێتە سەر.

**مێر** (باک.): پیاو، زەلام، مێرد، شوو. ـــ کرن: مێردکردن.

**مێر** (کە.): مۆڕ، مۆن، گرژ. ـــ بوونەوە: مۆڕبوونەوە.

**مێرانە:** ئازایانە.

**مێرانی** (باک.): ئازایەتی، پیاوەتی.

**میرانی** (باک.): ئازایەتی.

**مێرەم** (هەو.): حەوتووی سێیەمە لە (٨) حەوتووەکانی زستانێ کە لەنێوەڕاستی بەندرخە و ئۆخە نێدایە.

**مێرچاک** (بابا.): ئازا، نرخدار.

**مێرخاس**: مێرچاک.

**مێرد**: شوو، مێر، هاوسەر، پیاوێکی ژنی هەبێ دەبێتە ـــ ی ژنەکەی. ـــ کردن: مێرکردن، بە ـــ دان: ژن دانە مێرد. ـــ ی دووژنە: ئەو پیاوەی دووژنی هەبێ.

**مێردەزمە** (بابا.): (هەو.) مێردەزمووکە، دێوەزمە، خێو، مۆتەکە.

**مێردی**: پیاوەتی.

**مێردە زمووکە** (هەو.): مێردەزمە.

**مێرک** (باک.): پیاوی سادە. شەیتان.

**مێرکوژ** (باک.): خوێنڕێژ، پیاوکوژ.

**مێرگ**: مێرغوزار، شەکار، چیمەنزار. (یەز.) شەیتان. (کۆ.) گیایەکی گەڵاووردە.

**مێرغوزار**: مێرگ.

**مێرگەشە** (باک.): چیمەن.

**مێرگزیبرکێ**: یاری جگانێ. شارەزای کاروباری پیاوان.

**میرنشین**: ئەمارە.

**مێروو**: مێرووڵەی گەورە، مووریی، میرۆ، (زەن.) میرۆچە.

**مێرووچە** (زەن.): مێرووڵە، مێروو.

**مێرووستان**: شارە مێروو.

**مێرووڵە**: مێرووی چکۆڵە، مێلوورە، گێرکە، گرنک، مرۆچە، مۆرییلە، (باد.) مێویی. ـــ سوورکە: گێرکە. ـــ کردن: سڕبوون.

**مێرووی وورد**: (ڕەوا.) گرکە، (زەن.) گەنەمۆری.

**مێرهۆڤ** (باک.): مرۆڤ.

**مێزدیسەنی**: سێ ووشەیە: (مە): گەورە، (زدا): زانای بێ هاوتا، (یەسنە): پەرستن. دەبێتە: زانای بێ هاوتای پەرستنییە بە تایبەتی بۆ ئایینی زەردەشتە.

**مێز** (کە.): میز، ماسە. ـــ ی نانی: ـــ ی نان لەسەر خواردن. ـــ ی نووسینی: کارمەزەل.

**مێزاب** (باک.): جێگایەکی ئەوتۆیە کەوی لێ دادەنرێ بۆ بانگ کردن.

**مێزاندن** (باک.): تەماشاکردن.

**مێزان** (کە.): میزتنی ئاش، دەغل ڕزین. میزتن.

**مێزە**: تەماشا، ڕوانین. ـــ کردن: تەماشاکردن. (باک.) تەماشا، چێرە، ـــ کرن: چەژتن، تەماشاکردن.

**مێزەر**: شاشک، ئەردی، مەندییل، (ڕۆژ.) پووتک.

**مێزەلان** (بابا.): میزدان، میزەڵدان.

**مێژ**: کۆن. لە ـــ ە: کۆنە، لە دێرزەمانەوە.

**مێژاندن** (باک.): مژاندن، شیردان، بمیژینە.

**مێژەک** (کە.): ئەوەیە کە غەیری دایکی خۆی بمژێ، ئەو کارو بەرخەیە کە دایکی خۆی نەبێ و نیتر بمژێ، مێژکە.

**مێژەکردن** (ڕەوا.): مژتن، مژین (بۆ منداڵ).

**مێژەلووک** (قەرە.): مێوودارو گیاییێکی چڕو پڕە، چڕ.

**مێژەبوهێر**: ڕابردووی دوور.

**مێژوبێژ**: مێژوو گێڕەرەوە.*

**مێژڤە**: لەمێژە.

**مێژک** (باک.): مێشک.

**مێژوەرد** (موک.): زەوییەکە لەمێژ بێ وەردبێ کە پڕ دەبێ لە گیاو گوڵاڵە سوورە و گیاجارڕیشی پێ دەڵێن. میشۆرت.

**مێژکە** (ڕەوا.): مێژەک، مییژەک. بەرخ یا کارییلەیەکی بێ دایک بێ و هەر جارەی یەکێکی بمژێ یا بخرێتەوە بەر یەکێکی دی.

**میزمیزۆک** (باک.): گیایەکە، مژمژە.

**مێژوو**: دیرۆک، دێریک، دێرۆک، دییرۆک، دییرێک. (باد.) دووررۆک. ـــ ی وێژە: مێژووی ئەدەب.

**مێژووزان**: مێژووناس، مێژووان، دیروکڤان.

**مێژووک** (بابا.): وولاخێکە نەیەوێ شیری بە فەرخەی خۆی بدات.

**مێژووکرد**: ئەوەی بە درێژایی مێژوو دروست بووە.

**مێژووناس**: مێژووزان.

**مێژی** (شکا.، باک.): مێشک، مێژوو.

**مێژونک** (ژە.): شەمشەکوێرە.

مێژونک

**مێژییلانک** (باد.): مژۆڵ.

**مێست** (شکا.): ماست.

**مێش** (شو.): مەڕ، (هەورا.) مەش، مەگەس، مەیەس، مەوز.

**مێشان**: مێشک. مێشی چکۆڵە.

**مێشە** (ڕۆژ.): مۆز کردنی وولاخ لەبەر پێوەدانی مێشان و مۆزان. (موک.) پێشە، چەم، وێشە، جنێک، دارستان، دەوەن.

**مێشەسەگانە**: مێشی سەگان.

**مێشەسی** (کە.، جا.): چێرک، چرک.

**مێشەکەران**: مێشێکی گەورەیە تایبەتی بە کەرو وولاخی بەرزە، مۆز.

**مێشەگەز** (ڕەوا.): مۆز، کەرمۆز.

**مێشەنگ** (کە.): هەنگ، (کە.) پێش هەنگ.

**مێش خۆر** (باد.): مێش خورینک، باڵندەیەکی چکۆڵەیە بن باڵ و بەرزگی سپییەو سەری بۆرە، هەنگەخۆرە، هەنگان دەخورا.

**مێش ڕەو** (مامە.): سوواندە، گوێ سوانە.

**مێشرەف** (باک.): لیڤە، مەژالک، مەژیی، مەژگ، ژەم، (باک.) مێژی، دەماخ، (هەورا.) مێژک، (باک.) مێشی چکۆڵە.

**مێشک** (فە.): مەغز، بێ ـــ: هێڕ، دەبەنگ. بێ ـــ ی: بێ عەقلی.

**مێشکۆڵە**: مێشکی بچکۆڵە.

**مێش ومەگەز**: حەشەرات، جانەوەر.

**مێشکوژ** (باک.): دەسکەگیا یا هەر چتێکی مێشی پێ بکوژرێ.

**مێش هەنگ**: هەنگ.

**مێش هەنگوین:** بڕوانە: هەنگ.

**مێشوولەبەند:** کولەبەند، پێشی بەند.

**مێشوولە:** پێشکە، پیشۆ، مۆر، هوورده، پەخشە، مەشوولە، پێشـوولە، کـەلمێش، گمـۆره، پـۆ، خـۆره. ـــ ی وورد: کورکورۆک، ئاخۆره، پێشوکورک، خاکە. دەردێکی چاوانـە هەمیشـە چتی ووردی بـە بـەرچاواندا دێت. ـــ خـۆر (زا.): ورروار.

**مێشمیزک** (باد.): مژمژه (گیایەکە).

**مێشین** (بـاک.): جووره گـەمـەیـەکـه منداڵان پـوول یـا چتی دەچەقێنن بـه مـەرمـەرلێی دەدەن. شیرین. ـــ ی (باک.): شیرینی.

**مێڤان** (باک.): میوان. ـــ ی (باک.): مێوانداریی.

**مێڤانخانە:** مێوانخانە.

**مێڤاندار** (باک.): مێواندار.

**مێڤانکی** (باک.): وەکو میوانان. ـــ دانیشتن: لـەسەر ئەژنۆ دانیشتن.

**مێڤانی** (باک.): میوانداری.

**مێڤانەهوین** (باک.): میوانئەواز.

**مێکەو** (باک.): کەوی مێ.

**مێکوت** (جا.، کە.، رۆژ.، باک.): میخکـوت، کوتکی میخی، کوتـک، چەکوچە.

**مێکوتە:** جووره کولکێکه لـه هەموو منداڵان دێ وەکو قوونێرێکی چکۆڵـه وایە. جووره زیپکـەیـەکی گەورەیە بنی سوورو سەری زەرد دەبێ.

**مێکووک:** گیایەکە بنەکەی بکرێتە دۆشاو بۆ چیکڵدانە زۆر بـەهێزە. (دا.، کە.، شار.) بەلـەک. (باک.) بـەلـک، بەلـەگ. شیرین شیرنۆک. ـــ ی جۆلایی: شەپۆیە.

**مێگان** (شەم.): نێنکۆرێن.

**مێگـەل:** رێـن، ران، کـەر، کـەرد، گەلـە، رەود، گێلـه، مێیـەل، هێشت، مـەر، باقوور، پیپلک، ـــ ی مەڕان: پەز.

**مێگەلەوان:** شوان، خاوەن مێگەل، گەلە خوێ.

**مێگوان** (باد.): نێنگوین.

**مێگۆن** (باد.): نێنگوین.

**مێل:** میل، ـــ ی تەرازوو: زمانەی تەرازوو.

**مێلاق:** ئاونگی ترێیەکە بۆ زستانان هەڵبگیرێ و پەروەرده بکرێ.

**مێلاقە:** گوڵێکی سـوورو کێوییـە لـه خاشخاشی گـەورەو خۆڕاگرتـره، بڕوانە: (گوڵەمێلاقە).

**مێلاک:** تام، چێژ. ـــ کردن: تام کردن، چێژ وەرگرتن.

**مێلام** (باک.): دارێکە.

**مێلاو:** نارجیلە، نێرگەلە.

**مێلووره** (کە.): مێروولە.

**مێل مێل:** راڕا.

**مێمان** (هەورا.): میوان.

**مێمک** (باک.): گوڵی داران.

**مێمڵ:** دژ، ناحەز، نەیار، چەل ومل، بوونە وەرێکی خەرافییە لـه جنۆکە ئەشقی ئافرەت دەبێ و خۆی دێنێتە سەر شکڵی ئاژاڵ یان چتی تر. (بۆ تـە ـــ بە ملمەوە).

**مێنەکە** (موک.): ئەنگوستیلەی جوانی لە شاخی کەڵ وگامێش دروست دەکرێ.

**مێندی** (دەر.): ماندوو.

**مێنگوین:** نێنگوین.

**مێو:** مۆم، شەم، قرچەنە. زیبچ، مێوی هەنگوینی، قرقرۆک، دەرمێو، شەمێ. ـــ بڕین: کـەرەکردن، داری ترێ، مییـو، (باک.)گوڵـی داران. ـــ بڕ: دەربستکان.

**مێوان:** میڤان.

**مێوە:** فیقی، رزق.

**مێورزیی** (باک.): هاتنەخوار، خراپ بوون.

**مێوژ:** مـەوییژ، مـەهووژ، مـەڤیژە، (هەورا.) هیچکوچی. ـــ ی رەش: مێوژە رەشکە، ـــ ی سوور: مێوژە سۆرکە.

**مێوژە رەشکە:** مێوژی رەش.

**مێوژەمەلا:** مێوژەمەلە، جووره مێوژێکە.

**مێوژە مەلە** (رەوا.، هەو.): مێوژەمەلا.

**مێوی** (باد.): مێروو، مێروولە.

**مێویژان** (بار.): گیایەکی نێرتک داره میترێک بڵند دەبێ گوڵی سوورو بۆنی خۆشە. (گەر.) بێویژان.

**میڤان** (زا.): میوان.

**مێیینە:** مەها، مێ، مایینە، ماک.

**مییو** (باک.): دارەمێو.

**میداد:** قەلـەمی رەساس، قەلەمزرێژ.

**می** (باک.): مەر، من، مەری سێ ساڵانەیە. (فە.) موو، تووک.

**مین ووراز:** مووی بەراز، نەخۆشی موو.

**میو:** دەنگی پشیلەیە. میاوەمیاوە: نێوی دەنگی پشیلەیە. میاوەمیاو کردن: میاواندن.

**میاواندن:** میاوەمیاو کردنی پشیلە.

**میانەرەو:** نە چەپ رەو و نە ڕاست رەو.

**میتەل** (باک.): دۆشەگ.

**میترا:** خودای هەتاو.

**میتکە:** گوڵنگ، ئەڤک. (ئەرده.) میکرۆب، (هەورا.، رۆژ.) بەلۆکە، (بابا.) قیتکە، (رۆژ.) کوورکە. ئەو پارچە گۆشتەیە کە لـەنێو شەرمی ئافرەتانە.

**میتکنە:** میتولکە.

**میتێن** (شار.): ماتێن.

**مییچ** (هەورا.): قرنوو، سڤییک، کۆسەر. (باک.) ئارزنج، زکێ خێنی، مییچی بانی، ساپیتە، سەراپیتە، رووکاری ژێرەوەی بانییـە. سنگ. (کە.، بابا.) جگ. ـــ لـەسەر گرتن: پێدا گرتن.

**میچکاندن** (باک.): داگرتن، هێنانە خوار، (بمیچکێنە).

میبچێن (بابا.): جگێن.

میبچ میبچێن (بابا.): جگێن.

میبخ: سنگ.

میر: لە جگێنیدا کە لاتەنیشتە گرنی گرنییەکەی بکەوێتە لای سەرەوە. ـ ی گەورە: پاشا، خوونکار، خووندکار، کەی، پادشا، شا، حوکمدار، پاشا، میرەک. ئاغای ئاغایان، براگەورەی ئاغایان. پادشای هەنگانە. لە شانۆدا بەکاردەبرێ. ـ یی: خوونکاری، خووندکاری، پاشایی، پادشایی.

میرات: سەربەش، پاشماک. ـ ی: پاشماوەیی.

میراتگر: ئەوەی پاشماکی بەردەکەوێ.

میراخور: سەرۆکی مەیتەرو سەییزانە.

میرئالا (زا.): ئامیرلیوا.

میراس (هەورا.): بیراز.

میراش: سەرۆکی ئاشپەزان. میراف، میراو.

میران: ووشەیەکی گەورە کردنە لەکاتی گفتوگۆدا بۆ ڕێزگرتن بەکاردەبرێ. ناوی هۆز (عەشیرەت) ێکی کوردە لەلیوای مووسڵ (٦) هەزار کەس دەبن. ناوی نێرینانە.

میرانە: لە مهرانەوەیە. (باک.) میرانی، شایانە، هەمایونی.

میرانی: میرانە.

میراو: سەرپەرشتیاری دابەش کردنی ئاو، کەسێکە بەسەر ئاوێ ڕابگا. (باک.) میراف.

میرایەتی: میرنشینی.

میرە (هەورا.): متوموورو بۆ خشڵ.

میرە دێ: گوندی گەورە.

میرەک (باک.): پاشا. پادشا. میری بە سەڵتەنەت.

میرزا: کوڕەمیر. کاتب، (خۆ.) بۆ پیاوی خوێندەوار بەکاردێ. ـ یی: خوێندەواری.

میرفان: شایی، شاهی، پادشایی.

میرمیرانێ (هەورا.): میرمیرێن.

میرکان (فە.): شوێن، شوون.

میرکاری: ڕەسمی.

میرکوت (باک.): کوتک.

میرمیرێن (موک.): میرمیرانێ.

میرۆ (باک.): مێروو.

میرکور (شا.): هەڵکەوتوو.

میروو (شا.): مووروو.

میرنشین: خاکی میریی. ـ ی: ئەمارەت.

میری گەورە: سوڵتان.

میری میران: سوڵتان.

میرووک (باد.): جەواڵ یا هەر چتێکی لێواولێو پڕبێت.

میرێنی: خوونکارێتی، پێداریی، شاهێتی.

میری (باک.): غەرامەت یا ئەملاکییە.

میریتی (باک.): میرێتی.

میرینی (باک.): ئەمارەت، ڕیاسەت، سەڵتەنەت، خوونکارێتی.

مێز: مێز، ڤۆک. ـ کردن: پێشاوکردن. ـ گیران: بەستەوانی.

میزان: مێزان، میزتنی ئاش: کە دەورەی بەرداشەکە ژێرەوە کونی تێبێ دەغڵی پێدا دەچێتە خووارەوە دەڵێن میزتی، دەمیزی.

میزاو: نزاو.

میزەلان (بابا.): میزدان.

میزەڵدان: دەبدەبە.

میزەگا (هەورا.): مارپێچ.

میزە سربینەک (باک.): میزگیراو.

میزەل (باک.): میزکەر لە نووێنیدا.

میزتن: میستن، میزان.

میزپەو (فە.): میزدان.

میزدەو (فە.): میزدان.

میزدۆ: میزدان.

میزدان: مێزەلان، (بابا.) میزەلان.

میزدۆ: کیسکێ نووزێ، تکەمیزە.

میزگیراو: میزە سربینەک.

میزکەری (باک.): جێگای میزکردن.

میزگیران: گیرانی بۆڕی میز و مانەوەی میز لەناو میزڵدان.

میزمیزک (کە.): پیسپیسک (دەعبایەکە).

میزی خوێنی: بەلهاریزیا.

مێزوینە: نیسکێنە.

میزەک (کە.): کارو بەرخی بێ دایکە، کە ئیدی بژێ، مێژکە.

مێژوێ (هەورا.): نیسک.

میسن (باک.): میزتن.

میس میس (خۆ.): گەڵای شین و گوڵی درێژەو ئاوی تێدایە. مژمژە، شیرمژە.

میش (کف.): مشک. (فە.) مشک. ـ خورما (فە.): مشکی خورما.

میڤان (باک.، باد.): میوان.

میکائیلی: تیرەیەکە لە جاف.

میکرۆب: جرسوم. ماک.

میکرۆسکۆپ: زەڕەبین.

میل: نیشاندەر. ـ ی تەرازوو، ـ ی ڕێگایان، میل. ـ ی کاتژمێری: عەقرەبی کاتژمێری. ـ ی کلدان: کلچێوک. زەرووەد. مرازێکی چیپکەنەیە، ـ ی برینان: ئەو میلەی لە برین دەدرێ، (ڕەوا.) نۆرپینگ، مۆڵگەی کێوییانە، بۆسەی شەڕێ و ڕاوێ.

میلوان (کە.): ئێخەی کراسی. (ڕۆژ.) لای دەرەوەی گەردەنی کراس.

میللی: تیرەیەکە لە کوردی باکوور.

**میم:** پوور، پلک. میمک.

**میمان** (فە.): میوان.

**میمانخانە:** میوانخانە.

**مییمتک** (باد.): موورتک.

**مییمک** (کە.، فە.): بڕوانە: میم.

**مییمکزا:** پوورزا.

**مییمێ:** پوور، پلک.

**مییـنا:** میـنای دەریایـە، لییمـان، کەشتیگا، بـەندەر، نۆلا، وەکـو. مییـنا هـەڤ: وەکوویـەک. (بـاک.) گولێکـە، شووشـە، بلـوور، ئاوێنـە، کـلاوی شەری.

**مییێ:** مژتن.

**میینـاک** (باک.): ژەهر.

**میینـک** (ڕەوا.): ئازارو دەردی دەستانە وەکو: ئیفلیجی، گۆجی.

**میینگە:** ڕیینگە. ـ مییـنک: ڕیینگەڕیینک.

**میینوو** (ئاوێ.): بەهەشتی جاویدان.

**مییوان:** مێمان، مێڤان، مەهوان، مهڤان، مییڤان.

**مییوانانە:** میڤانکی، وەکو مییوانان.

**مییوەر** (فە.): بەر، تووکی بەر.

**مییوانخانە:** مییوانگە، مییڤانخانە، مییمانخانە، چەقرە، قۆناخ، بنەگە.

**مییواندار:** خانەخوێ، میڤان هەوێن. ـ ی: مێڤانی، ـ کردن.

**مییوانگـە** (دزە.): مییـوانخانە.

**میهرکان:** میـهرەبان.

**مییوانی:** قەیاخ، نییمان، مرتۆخە.

**مییوە:** فیقی، هەسوو، مییوەجات، بـەری دارانـە وەکـو سێو و قەیسی و هەلوو جەو ئیدیکە. ـ ی ترش: نەگەییو، ـ ی وەرییو: لە دار بوەوە.

**مییوەگەن:** گەلاوێژ، تیرمەه.

**مییوەمـارە:** گیایەکە لە بن داران هەڵدەچی و لێیەوە دەهاڵێ کە بریندارییـی کەی شیرییی لێ دێ.

**میە** (یەز.): مەڕ.

**مییهر:** ڕۆژ، خۆر، بەزەیی، دلەشک، بێ بەزەیی.

# ن

**ن:** تیپێکی نابێی کوردییـە. نیشـانەی کۆی دیـارو نادیارە، وەکـو: بـڕۆن، بابڕۆن.

**ناء:** نا، نە، نەء، نەخێر، نەو، ناو، چ.

**نا:** بۆ یەکخستنە، تەنها یان لەگـەڵ ووشـان بـەکاردەبرێ. وەکـو: ناڕاسـت، ناچم، ناڕۆم: واژیی دەچم و دەڕۆم. دەنا نا؟ ئەدی نا؟.

**نائومێد:** بێ ئومێد، ئومێدبڕاو، بەئاوات نەگەییو.

**نابلو:** بێ هەرمێن، شتێک، کە باوی نەبێ، بێ برەو.

**نابەکار:** بەدکار، بەدکردەوە.

**نابەهەنگام** (باک.): بێهەنگام.

**نابەدڵ:** ناپەسند، شتێک، کە نەچێتە دڵەوە. پێچەوانەی دڵخواز. ـ ی: ناپەسندی.

**نابەڵەد:** نەشارەزا.

**نابوود:** لات. ـ ی: لاتی.

**نابووت:** بـێ پوول وپارە، هالکـە، لـەپارە کـەوتوو، لات، قـەلات، ڕووت، مایـەپووت، مایـەپووچ، نـاوییت. ـ ی: لاتـی، ڕووتـی. چووکەلـەو پەرپووت و تووت، لەڕولاواز. مرۆی ـ: پووچەڵ، نابوود، جوڕە.

**نابێ:** ناشێ.

**نابیینا:** کوێر.

**نابییتک** (باد.): وەردینە نانی، تییرۆک.

**ناتاو:** نادروست، ناپوخت.

**ناتووان:** کەسێک، کە توانا نەبێ، بێ دەستەلاّت.

**ناپارێزی:** خۆ لەشت نەپاراستن. سڵ لە شتی ترسناک نەکردن.

**ناپاک:** خائن، زگڕەش، نگرییس. پییس، پیتۆکە. ـ ی: ـ کردن.

**ناپەسـند:** ناپەسـن، شـتێک، کەبـەردڵ نـەگرێ. ـ ی: ناپەسـنی، ناپەسەندی.

**ناتەواو:** ئەو شتەی، کە تەواونەبێ، بەکەموکوڕی. ـ ی: کەموکوڕی.

**ناتۆر** (باک.): کێشـکچی، نۆبـەتچی. (بـاک.) ـ ی: کێشـکچێتی، نۆبەتچێتی.

**ناتۆرە** (جا.، ڕۆژ.): نەتۆرە، بەدنێوی، ناوونرتک، نێوونرتک.

**ناتۆرڤان** (باک.): بڕوانە: ناتۆر.

**ناتووان:** ناتەوان. بێ تین، بێ تاقەت. ـ ی: بێ تینی، بێ تاقەتی.

**ناجسە:** ناجستە، نابووت.

**ناچار:** نەچار، بێ چارە، تەنگاو، پاپا، زۆر لێ کردن. ـ ی: (باک.) بڤی نەڤینەیی.

**ناچارە:** لەسەریەتی.

**ناچە:** بڕوانە: ناوچە.

**نـاچی:** نـاڕوا، ناشـوبهێ، شـتێک لـە شـتێک نـەچی (نـەچێ).

**ناچییزە:** ئافرەتی ناکەس و ناڕەسەن، ئەو ژنـەی، کە سەرپێچی لە مێردی دەکا.

**ناحەز:** دوژمن، ناشرین، کرێت. نەتەچاو، (پژ.) دزێـو، (باک.) بـەرۆک. ـ ی: دوژمنایەتی، دزێوی.

**ناخ:** قووڵایی، بـن، ژێر. بـەناخی زەویدا چوونـە خوارەوە، بـەناخا چوونـە خوارەوە. ـ ی زەوی: قووڵایی زەوی، بـنی عـاردی. ـ ی دەروون: نـاو ژوورەوەی مرۆڤ.

**ناخار** (سن.): زبر، بەدفەڕ، شەڕنەنگێز.

**ناخاس:** بەد، کەسێک یان شتێک، کە چاک نەبێ.

**ناخر** (باک.): گاگەل.

**ناخرقەوان** (باک.): ڕۆژێکە وولاتان لەوەڕ جوێ دەکرێنەوە کە ڕێککەوتی ١٠ی کانوونی یەکەم (جانیوەری) (دەستوورێکی کۆنە).

**ناخودا**: کەشتیران، کەشتییەوان.

**ناخووا**: ناخودا، کەشتی ڕان.

**ناخۆش**: گووج، ناوەش. ـــ ی: ناوەکوول، ناوەسی.

**ناخوون** (هەورا.، شو.): نینۆک، نوخان.

**ناخوونەک**: خۆڕایی، خواردنی شتێک بەبێ پرسی خاوەنی. ـــ دەر: کەسێک، کە ناخونەک بکا. بەخۆڕایی خۆر.

**ناخووین** (جا.، دەل.، ڕۆژ.): نینۆک.

**نادان**: نەزان. ـــ ی: نەزانی.

**نادر**: نێوی پیاوانە.

**نادروست**: نادروس. پیاوی چەوت و خوار.

**نادیار**: نەبانۆک، (هەورا.، زەن.) پیوار، بێ شوێن، بێ ڕێ، بێ جێ، بزر، ون، کەسنەزان. ـــ ی: بێ شوێنی، بزربوون.

**نادیتە**: کەم دیبیتە، چرووک.

**نار** (هەورا.): هەنار.

**ناڕاست**: نەڕاست، سەرچەوت، قەلپ وقوولاپ، درۆزن، ناساخ، هەڵەکار، بلّح، دەخەڵ، فیبچەلفاچ. ـــ ی: سەرچەوتی، فیبچەڵڤاچ.

**ناڕاو**: تالاو، زووخاو.

**نارەسەن**: ناجسن، نائەسڵ.

**نارەوا**: نەشیاو، نادروست. ـــ یی: نەشیاوی، نادروستی.

**نارچە** (دزە.): حەشارگە، سپێر.

**ناردرانەوە**: ڤەزڤرین، گەڕانەوە.

**ناردراو**: نێرراو، نێردراو، ناریاگ، نوێنەر، پێغەمبەر، پێخەمبەر.

**ناردن**: هەناردن، شاندن، شەهاندن، (لو.) کیانەی، ڕەوانەکردن، وەرێخستن، (ژاوە.، هەورا.) کیاستەی، هنارتن، (ژاوە.) کیاسەی گیلان، (فە.، لو.، کەل.) کل کردن. (کەل.، زەن.) کیاندن، بەڕێ کردن، ڕێ کردن.

**ناردنە دەرەوە**: ناردنی شتێک یان کەسێک بۆ دەرەوە.

**ناردنەوە**: ڤەزڤراندن، گەڕاندنەوە، (باک.) داگەڕاندن کزریی، زڤڕاندن.

**نارنج**: ترنجۆک، هاڵە پیرێژنانە، نێوی ئافرەتییە.

**نارنجەک**: بۆمبای دەستی (بۆمبایەک، کە بە دەستی دەهاوێژرێ). ـــ ی دەستی: دانە.

**نارنجبۆ**: لیمۆ، ترنجۆک، هاڵە پیرێژنانە.

**نارنجۆک**: نارنجەکی دەستی.

**نارنجی**: نارووجە.

**نارووجە** (باک.): نارنجی.

**ناروونەر** (باک.): مرقەمرقی بەرازی.

**ناریاگ**: بڕوانە: ناردراو.

**نارێک**: پرۆز، بەژک، بیکیس، بێ سەروبەر، لیخ، چەور نەڤەکری، نالەبار، ناقۆلا. ـــ ی: بەژکی، بێ سەروبەری.

**نارین**: گۆرانیی بووکی. نالّین، گریان و دادو فیغان. ناسک و باریک.

**ناز**: (باک.) گۆبەند، گۆبەن، فێڵ. لارولەنجە، گرێشمە، عیشوە، چڤ. جۆرەهەڵپەرینێکە. ـــ کردن: شانازی. بە ـــ: وەناز، نازدار.

**نازار** (هەورا.): نازدار.

**نازاو** (کۆ.): شیبیناوەرێکە بە ئاو کەوتبێ و خراپ بووبێ.

**نازانم**: چوزانم، چزانم، چن زانم.

**نازەنین**: نازدار، ناسک، نێوی ئافرەتە. ـــ ی: نازداری، ناسکی.

**ناز بالگەه** (باک.): سەنبیری چکۆلە، سەرینی بچکۆلە، ناز بالییف، ناز باڵنج.

**نازبالییف**: سەنییری چکۆلە.

**نازباڵنج**: سەنییری چکۆلە، بنسەر.

**ناز پەروەر**: نێوی ئافرەتە.

**نازدار**: نێوی ئافرەتانە، خاڵدار، دڵبەر، نازەنین، خاوەندناز، بەناز. ـــ ی: بەنازبوون، نازەنینی.

**نازداری**: نازونییوناز، نازونییمناز.

**نازک**: ناسک.

**نازکە**: پارچەی ناسک، ناسکە، نازکەنازک، نووسکە.

**نازکەر**: کەسێکە ناز بکا.

**نازکەنازک**: دەنگی زۆر بێ هێز، نووسکەنووسک.

**نازک کار**: کاری وورد، ووردەکاری

**نازکی**: ناسکی، باریکی، نەرمی.

**نازکێ**: بەناز.

**نازناز** (موک.): نێوی ئافرەتە، گیایەکە گوڵەکەی وورد و هەمەڕەنگەیە و بێ بۆنە، لەگەڵ ڕۆژهەڵاتن دەپشکوێ و لەگەڵ ڕۆژئاوابوون دەپووچێتەوە.

**نازناو**: ناوی هەڵبژاردە.

**نازووک** (باک.): پارچە مرازێکە لە کەرەستەی تەونی.

**نازو گۆز** (دزە.): لارولەنج، بۆ دوور و نێزیک.

**نازونووز**: نازکردن.

**نازونییوناز**: نازو نی حیبشوە، لارولەنج، خاوخاو.

**نازی**: نێوی ئافرەتانە. (باک.) عیشوەگەری.

**نازین**: شانازی.

**ناژتن**: نژاندن، ناشتن، مردوو لە گۆڕێ دانان و داپۆشینی، نێژتن، پۆشین. شەتڵ و نەمام لە زەوییدا چەقاندن.

**ناژران**: نێژران، نێژان.

**ناس**: ـــ کرن، ناسین. (باک.) ناسراو، بەناوبانگ.

**ناساخ**: ناساز، نەخۆش، نەساخ. ناڕاست. خۆ ـــ کردن: خۆ نەخۆش خستن. ـــ ی: نەخۆشی، ناسازی، نەساخی.

**ناساز**: ناساخ، نەخۆش. ناقۆلا، نالەبار، نارێک، بێ کییس. ـــ ی: نەخۆشی، نالەباری، نارێکی.

**نسازگار:** لە لەش ناخۆش. ـــ ی: نەخۆشی، ناساخی، نەساخی.

**نسازیی جارەکی:** ناسازییەک، کە هەمیشەیی نەبێ. ـــ هەمیشەیی: ناسازی بەردەوام.

**نسراو:** دیار، خوویا، ئاشکرا، ئاشنا.

**نسرومال مال:** گۆرانییەکی کۆنی کوردییە لە (١٢) بەش پێکهاتووە.

**نسری** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**نسک:** سەرەگیا، توورت، جەلک، چەلەبی، نازک، ناسکۆل، رازراڤ، تەرجک (بۆ چتی خواردنییە). قازاخ، نازک، نازەنین.

**نسکانە:** نازکانە.

**نسک بەدەن:** نازک بەدەن، پەری ئەندام، نازەنین.

**نسکە:** لووسکە.

**نسکەنسک:** نووسکەنووسکی سەگییە.

**نسکەنان:** کولێرەناسکە. نانێکە ڕۆنی لێدەدرێ و لە سەر سێلی دەبرژێنرێ.

**نسکۆڵ:** ناسک.

**نسکۆڵە:** ناوی ئافرەتانە.

**نسکۆڵی:** ناوی ئافرەتییە، ناسکی.

**نسکی:** ناسکۆڵێ، نێوی ئافرەتییە. رازراڤی، لەوەندی، توورتی.

**نسنامە:** پێناسە.

**نسوور:** ناسۆر، برینێکی پیسی بێچارەو کۆنە، تیسراوی، بە برینی کۆنی بیوەسییریش دەگوترێ.

**نسیی:** زانیاری، (باک.) ناسینی.

**نسییاو:** ناسیاو، دۆست، ئاشنا، برادەر، دیبوناس. ـــ ی: دۆستایەتی، ناسیاوی، دیبوناسی.

**نسیارێتی:** ئاشنایەتی، برادەرایەتی.

**نسیاگ:** ناسراو، ناسیاو.

**نسیاوێتی:** دۆستایەتی، بردەرایەتی، ئاشنایەتی، ناسیاوی.

**نسیێلک** (بار.): نێوساجی.

**نسیینڤیسارید مێژوویی** (باد.): نووسیاری زانستیاری مێژوویی.

**نسیین:** ناسکرن. یەکترـــ : ناسینی یەکتری.

**نشایستە:** ناشایان.

**نشتا** (بابا. کە.): خووین، بەرۆژوو، ڕۆژوودار. ـــ شکێن: ڕۆژووشکێن، یەکەم جەمی خواردنی سەرلەبەیانی. ـــ یی (بابا.): خوورێنی، ئاناشتایی، ناچاری.

**نشتە** (هەورا.): (بابا.) ناشتا، خوورین.

**نشتی:** نازتن، نەژراندن، چەقاندن.

**نشتنگە:** گۆڕ.

**نشنا** (هەورا.): ناشارەزا. ـــ یی: ناشارەزایی، ناشێتی.

**نشی:** نەشارەزا، نەخوێندەوار، نەزان. خۆـــ کردن: خۆسالۆزکردن

**نشێتی:** ناشنایی.

**نشیرین:** دزێو، ناحەز، کرێت. ـــ ی: دزێوی، کرێتی.

**ناعور:** (باک.) خەراف. جوورە بیبرێکە وولاخی بە دەوریدا دەسووڕێتەوە و هەمیشە لە بنەوە چەند سەتڵێک و چەند سەتڵێکیش لە خووارەوە بە تاڵە دەبێ.

**نفەک** (بابا.، جا.): نیفەک.

**نفرەجا** (کۆ.): ناهەموار، چەتەوڵ.

**نفس** (باک.): پشتەوە.

**نفک** (فە.): ناووک، نێووک.

**نفند** (باک.): ناوەند، تۆقی سەری، ناوچە.

**نفییرە** (فە.): مەقەست.

**ناڤ** (باک.): نێو، ناوبانگ، بناڤ و دەنگ، هەناو. ـــ پێ دان: نێو لێ نان. ـــ تێ دان: هاندان. ـــ پێ کرن: نێوبردن. ـــ گرتن: ناوبانگ پەیدا کردن. د ـــ رە: دەنێودا، بەنێوی را. د ـــ دە چوون: سەر نزم کردن، نزم کردن.

**ناڤاندن** (باک.): ناو لێ نان، ناوبردن، نێو لێ نان.

**ناڤبەر** (باک.): هۆ، بۆنە، نێوان بە پێ. د ـــ ا مەدا: دەنێو ئێمەدا.

**ناڤبر** (باک.): تەرخان، سەرپشک.

**ناڤبرێک** (باک.): تیبغ، دیوار، پەردە.

**ناڤبێن** (باک.): نێوان.

**ناڤبین چی، ناڤبینچی** (باک.): نێوبژی کەر.

**ناڤتەنگ** (باک.): تەنگە (لەقایش، پەتک).

**ناڤنۆ** (باک.): بەدنێو، بەدناو.

**ناڤچار** (باک.): قامکە گەورە و درێژەکەی نێوە ڕاستیە، هەڵمەقووتە.

**ناڤچییتی** (باک.): نێوبژی کاری.

**ناڤدار** (باک.): ناودار، نێودار. ـــ ی: ناوداری، نێوداری.

**ناڤداش** (باک.): وێک چوون.

**ناڤدەر** (باک.): دالان، نێودەرک.

**ناڤدەشت** (باک.): نێودەشت، دەشتێکی چکۆلەیە کەوتیتە نێو دوورشاخانەوە.

**ناڤدەنگ:** پشتێن.

**ناڤران** (باک.): نێوڕان.

**ناڤرۆ** (باک.): گراڤ، دورگە.

**ناڤرۆژ** (باک.): نیوەڕۆ.

**ناڤرۆنک** (باک.): دورگەی چکۆڵە.

**ناڤریز** (باک.): نێوانی دێران.

**ناڤزە** (باک.): تەنگە.

**ناڤسەر** (باک.): پییر، تۆقەسەری چشتی.

**ناڤک** (باک.): نێوک، نافە، نێوکی.

**ناڤکیل** (باک.): پشتێند، بەژن.

**ناڤلەپ** (باک.): فەرمانڕەوایی.

**ناڤلوو** (باک.): تەنباری نێو تفەنگی.

**ناڤلهەڤ** (باک.): وێکچوون، وەک یەک.

**ناقمال** (باک.): زەویی ژووری ماڵێ. (باک.) ـــ ی: ژنێکە ناومالی بەش بکات.

**ناقۆک** (باک.): جوورە تفەنگێکە. ـــ ا جەهی: ناوی تایبەت. ـــ ا گی: ناوی گشتی.

**ناقەلوو** (باک.): جوورە تفەنگێکە.

**ناقەنجی** (باک.): ناوەنجی، ناوەندی، نێوەنجی.

**ناقێش** (باک.): دەردی چیکلدانە، دەردی دڵ.

**ناق** (رۆژ.): گەردن، مل.

**ناقایل**: ناڕازی. ـــ ی: ناڕازی بوون.

**ناقۆر** (باک.): باڵندەیەکە.

**ناقۆلا**: زەلام یا وولاغ، یا چتێکە زل و نالەبار. حۆیە، زەبەلاح، حۆپلە، حۆپن، قمبە. چەتەوڵ، نالەبار، ناهەموار، پۆپ لاه، ناڕێک، وێنەچوو. ناساز، بلەزەندەر.

**ناکا**: ناکابیخوا، ناکا بڕوا، ناکا بێ.

**ناکام**: نامراد، نێوی پیاوییە. ـــ کەر: لەناکاو. ـــ ی: نامرادی.

**ناکاو**: نەکاو، پڕ، نەکاو، نشکۆ. لە ـــ: لەپڕ، لەنەکاو، یەکەندەردوو. ـــ ی: لەپڕی. کوتوپڕ.

**ناکەس**: نەتووکەس. هیچ وپووچ، نەزم، پەست، کەم. ـــ ی: نزمی، کەمی، پەستی، هیچ وپووچی.

**ناکۆک**: لنج، ناڕێک. ـــ ی: لنجی، ناڕێکی، نامۆیی. ـــ دەوڵەتان: ناڕێکی نێو دەوڵەتان.

**ناکورزیری**: دەستکورتی، هەژاری، دەستەنگی.

**ناگۆرە** (باک.): نرخدار، تازا.

**نال** (باک.): نەوال، نالی وولاخی، وەکو.

**ناڵ**: سۆلا هەسپی، بنی کەوش، ناڵ. ـــ ی ناسن. لە ـــ و بزماردان: دووزمانی.

**ناڵان**: کەسێک، کە لە خەمان بکرووزێتەوە.

**ناڵاندن**: کسکسین، کاڵین، ناڵەناڵ، نزاندن.

**ناڵە**: ـــ ی مرازی بەزمی.

**ناڵەبار**: ناقۆلا، ناهەموار، پۆپ. چەور، گرووز. گێژ، لاهیر، لەونەش. ـــ ی: لەونەشی.

**ناڵەناڵ**: نێوی دەنگێکە لە مرۆی نەخۆش. ناڵاندن.

**ناڵەهاوار**: ژاروژەنگ، ژاروزەنگ.

**ناڵبەکی**: تەپلک، دەردەنگ، ژێر ئیستیکان، ژێرپیاڵە، پیاڵە، تەبلە، (هەورا.) تابلە. (دەر.) بن پیاڵە. گەبۆل. (هەو.) بنبادە.

**ناڵبەند**: وەستای ناڵ دروست کردن. ئەوەی، کە وولاخی یەکسم ناڵ دەکا. ـــ ی: کاری ناڵ کردنی وولاخی یەکسم.

**ناڵبەنییس** (باک.): جوورە سەنییرێکە.

**ناڵچە**: پانیەی قوندەرە.

**ناڵین**: کیژ، نارین.

**نام** (هەورا.): نێو. (هەورا.) ـــ ەت چیشا: نێوت چییە. وە ـــ (کە.): بەنێو، بەناوبانگ.

**نامان** (فە.): سنوور، تخووب.

**نامە**: نووسراو.

**نامەخوا**: ناوی خووا هێنانە لە کاتی خۆشەویستی یان ڕەخنەگرتندا بەکار دەهێنرێ.

**نامەدان**: پاکەت.

**نامەدەنگ** (باک.): نێوبانگ.

**نامەرد**: ناپیاو، حیز، بێ زاخ، نامرۆ.

**نامراس** (فە.): نێوەڕاست.

**نامنز** (فە.): مارەیی.

**نامۆ** (موک.): نەبان، هۆگر نەگرتوو.

**ناموس**: ئایین، ئابروو، ئاوردە، شەرم. بە ـــ: بەئابروو، (باک.) بناموس. بێ ـــ: بێ شەرم، بێ ئابروو. ـــ شکان: ئابرووتکان. ئابرووچوون.

**نامی دەس** (شو.): بەری دەستی.

**نامییلکە** (موک.): پێغەم، پەیغام. (باک.) پاتن. (باک.) ژی.

**نان**: ـــ ی نێوەڕۆیە: نیوەڕۆژ، جەمی نێوەڕۆ. ـــ ی ئێواری: چێشتی ئێواری، شام، شیف. لووش. ـــ ی تەندووری. ـــ ی تیبیری: سەوک. ـــ ی ساجی. ـــ کەر: نانەوا، نان پێژ. ـــ کردن: پاتن، (باک.) ژی. ـــ ی ووشکی: نانی تسی. ـــ ی گەفی کرن: عەلەف و چاپلووس کردن. لنابێنا مەدا نان و خوێ هەیە. ـــ ی تەنک: تەنکیین. (هەورا.) نانە. چێشت. ـــ ی فەتیبر: نانی بێ هەویر ترش. ـــ ی هەلیبیلی (باک.): نانی بەگویز. ـــ ی هنگفی: نانی بە هەنگوین. ـــ ی سێلی: نانی سەر سێلی برژاو. نانی ساجی. ـــ ی شکیفی: نانی هەویر ترش. ـــ ی تەنووری: نانی لە تەندووربرژاو.

**نانا**: نەنە.

**نانانە**: پارە لەجیاتی نان یا چتێکی تر لەجیاتی نان.

**نان بدە**: خواردە، بەخشندە.

**نانەپاڵ**: شتێک، کە بخرێتە پاڵ شتێکی دی، شتێک بنرێتە پاڵ شتێکی.

**نانەڕەقە**: نانەڕەق. جوورە شێوێکە بەپارچە نانی ڕەق و ڕۆن و ئاو لێدەنرێ.

**نانە** (هەورا.): نان.

**نانەزگ**: کارکردنێکە بەرامبەرەکەی زگتێرکردنە و بەس.

**نانە چۆلەکە**: نانە کێشکە.

**نانەشانە** (جا.): سەلەی نانییە. (هەورا.) خوانە دارییینە، خوانچە.

**نانەشوانە** (کە.): گیایەکە.

**نانەشیینە** (هەورا.): مادە.

**نانەکەوە**: گیایەکە.

**نانەکێشکە**: نانەچۆلەکە.

**نانەوا**: نانکەر، نانفرۆش. ـــ یی: نانکەری، نانفرۆشی.

**نانەوە**: دانانەوە. مریشک ـــ: لەسەر هێلکە هەڵنیشاندن. ـــ ی داو: داو دانانەوە. ـــ ی شەڕ: شەڕ هەڵایساندن.

**نانەولا** (دەر.): چێشتە قوڵەی منداڵان، شییوە قووڵە.

**نان بریشک** (هەو.): دارێکی باریک و نووک تیژە نانی لەسەر ساجی پێ وەردەگیرێت.

**نان پێژ** (باک.): نانەوا، نانکەر.

**نان دەر**: نان بدەر، نانبەخش.

**نانەدەرمە** (باک.): کەسێکە لە ماڵی نەخۆدا.

**ناندێن**: شوێنێکە نانی تێدا دابنرێ.

**نان قەلە**: گیایەکە گەڵای وەئی نیسکی دەچی و کەلی وە پۆلکەی دەچی، قامکێک درێژەو ناخورێ، پێ قەلە.

**نانفرۆش**: ئەوەی نان دەفرۆشێ.

**نانکوور** (کە.): زۆر خۆر.

**نانکۆر** (کە.): سپڵە.

**نانکوێر**: سپڵە، بەدنمەک، نانکۆر. ـــ ی: سپڵەیی، بەدنمەکی، نانکۆری.

**نانکێزووڵە**: گیایەکە گەڵایەکانی قامکێک پانن.

**نان تانە، نانەنانە**: دەخڵێکە بە دەستگرۆیی بە سەپانان دەدرێ، پێشەکی و دوایی لێی وەردەگیردرێتەوە.

**نانگیر** (باک.): زەوییەکە بۆ چاندنی گەنم و جۆ باش و گونجاو بێت.

**نانوەرد** (باک.): جوورە چێشتێکە.

**نانی حەفتە**: ئەو نانەیە کە تا حەفتەیەک بۆ زاوای دەبەن.

**نانی زەماوەند**: نان و خواردنێکە لە شایی و زەماوەند دا لێ نرابێ.

**نانی گاڵ**: هەرزن.

**نانی هەنجیری**: (هەورا.) لەپۆرت. (بابا.) خەروە.

**نانی لەگلەگی**: (هەورا.) تۆڵەکە.

**نانی نانی**: هاواڵی خواردنی.

**ناو**: نا، نەخێر، نەو. نێو، ناوێ. ـــ کوێر بوو: ناو نەزانراو. دە، دەنێو: هووندر. ناوک. ئێستا، بەڵام تەنها بەکارنابرێن. لەناو پاش: لەمـەودوا. ـــ لێ نان: پاڵاوتنی کەسێک بۆ شوێنێک. ـــ لێ نراو: پاڵێوراو، کەسێک ناوی لێنرابێ. ـــ هاتوو: ـــ بردن: ناو هاوردن. بەناو: ناودار، ناڤدار، نێودار، بەنێوبانگ. لە ـــ بردن: لە نێو بردن، لەنێو چواندن. لە ـــ چوون: لەنێوچوون.

**ناواخن**: نێوئاخن.

**ناوال** (هەورا.): سنوور، تخووب.

**ناوە** (سا.): قوتوویەکی گەورەی دارینەی پەلە لەسەر شان دادەنرێت تا قوڕی پێ ببەنە سەربان بۆ سواغ و ئیتر.

**ناوەخوا**: نامەخوا.

**ناوەڕاست**: نێوەڕاست.

**ناوەرە**: ڕیخۆڵە، ڕیخەڵۆک.

**ناوەرۆک**: ناواخن، هەرچییەک، کەلەناو شتێکدابێ.

**ناوەرووکە**: نێوەرووکە.

**ناوەش** (هەورا.): ناخۆش.

**ناوەک** (ڕەوا.، خۆ.): ساوارێکە نە زۆر درشت و نە زۆر ووردبێ، بۆ برنجیش بەکاردەبرێ.

**ناوەکی**: شتی ناوەوە.

**ناوەندکور** (هەورا.): ناوەنگ. (خۆ.) نێوەڕاست، ناوەڕاست، ناڤند. ـــ ی: ناونجی، ناوبانگ.

**ناوەندیار** (هۆر.): نێوان بڕین، نێوبڕی کەر.

**ناوەنگ**: ناوەند، نێوەڕاست.

**ناوەنی** (هەورا.): بەرەوان، هۆ.

**ناوەوە**: هووندووری.

**ناوبانگ**: نێوبانگ، ناوێکە وە دووی خەڵکی کەوێ بە خۆشی یا بە ناخۆشی. ـــ دەرکردن: بەناو بانگ بوون. بە ـــ: کەسێک، کە ناسرابێ. وە ـــ: بەناوبانگ.

**ناوبراو**: گۆڕیین، ئاینین، نێوبراو، دەزگیران.

**ناوبریاگ**: بڕوانە: ناوبراو. دەزگیران.

**ناوبڕە** (باک.، ڕەوا.): تیپغەی نێو ژووران کە بکرێتە چەند دیبوێک.

**ناوبرۆ**: شیبیلە، نێوانی دوو برۆ.

**ناوبری** (باد.): ناوبراو.

**ناوبزە**: دوو ددانەکانی پێشەوەی ئەسپ و ماین و کەر و ئێستری سێ ساڵانەیە کە بکەوێ دەڵێن ـــ ی کەوتووە، شیبیلەی کەوتووە.

**ناوبژی**: نێوبژی: ـــ کردن: لێک جوێ کردنەوەی شە بو کوژاندنەوەی. ـــ کەر: نێوبژی کەر.

**ناوپارە**: ناوەند، دەورووبەر.

**ناوپەرچۆکە** (ڕەوا.): گیایەکە.

**ناوپەنچک** (سل.): ئەو پەردەیەی کە، کەرەستەی نێو سینگ لەناو زگ جوێ دەکاتەوە.

**ناوپێچ**: چتێکە لەنێو قەف و پێچی ڕیخۆڵاندا بە زلی پێوەیە.

**ناوپییستیر** (هەورا.، زرا.، سور.): نیفەک.

**ناوتەنگە**: جێگە تەنگە، نێو قەد.

**ناوتێلانە** (سن.): جیازی بووکی.

**ناوجی**: نیوانبین، ناوبژیکار. ـــ گەر: نێوانبین، ناوبژیکار.

**ناوچاڵ**: شتێک، کە ناوەڕاستەکەی چاڵ بێت.

**ناوچاوان**: نێوچاوان، ناوچاوان، (فە.) تێووڵ.

**ناوچاوپاک**: پیاوچاک.

**ناوچە**: هەرێم، دەڤەر، ناوەند، ناڤند، مەیدان. هنگ، پوونگاڵ. مەگەن.

**ناوچەوان** (بابا.، لو.): نێوچاوان.

**ناوچەی ڕووناکی**: ناوچەیەک، کە ڕووناکی تێدابێ، ناوچەی ڕوون.

**ناوچەی فرەشێوە**: هەرێم و دەڤەرێک، کە زۆر شێوەی تێدابێ. ناوچەیەکی ناتەبا.

**ناوچەی لێڵ**: ناوەندی لێڵ و نادیار. ناوچەیەکی نیوەنادیار. تەواو ڕوون نەبێ

**ناوچەی نووتەک**: ناوچەی لێلی تەواو.

**ناوچەی هەڵبژاردن**: ناوچەیەک هەڵبژاردنی تێدابکرێ.

**ناوچەی یەک شێوە**: ناوچەی تەبا.

ناوخاڵی: بۆش، بەتاڵ.

ناوخودا: ناوی خودا.

ناوخۆ: ناوەکی، ناوچەیی، پێچەوانەی دەرەوە.

ناودان: پلووسک.

ناودەرکەوتوو: کەسێ بە ناوبانگ، ناسراو.

ناودەس: ناولەپ، لەپ، ناومشت.

ناودۆک (هەورا.): نێوداری مەشکە، (دەر.) ناومیری، نیوەژەن، نەندوک. سووک.

ناوڕاس (فە.): نێوەڕاست.

ناوڕانەوە (هەورا.): پاڕانەوە، لالانەوە.

ناوڕەندنەوە: پاڕاندنەوە.

ناوڕتاڵ (زا.): نێوگەل.

ناوزگ: ناوسک.

ناوزووکە (هەورا.): دەنکەکانی نێو زەنگوڵەیە.

ناوساجی: نانی نێوسێڵ.

ناوشان: نێوشان.

ناوفەک (جو.): نیفەک.

ناوقاپانی هەوجاڕ: نێو قەفی هەوجاڕی، گەرووی هەوجاڕی.

ناوقەد: نێوقەد.

ناوکەرێژ (بابا.): (موک.) نێوکەرستە.

ناوک (کە.، هەورا.، لو.): نێوک، چەقالە، نێوک.

ناووک: نارک.

ناوکە (کە.): تۆو، تۆخم (ئیی خواردنی). برێشکە، ناوکی برژاوی وەک

ناوکەخووەشە: ناوکە قەیسی شیرین.

ناوکەن (هەورا.): مرازێکی بژارکردنێیە.

دەنکە کوولەکە و گوڵەبەڕۆژە و ئیتر.

ناوکۆ (کە.، هەورا.): مەیدان، گۆڕ. برێشکە، ناوکی برژاوی وەک دەنکە کوولەکە و گوڵەبەڕۆژە و ئیتر.

ناوکۆڵ: هەڵکۆڵینی ناوەوەی شتێک، شتێک، کە ناوەکەی هەڵکۆڵرابێ.

ناوگەرە: کرۆک، ناوەرۆک، ناوەند.

ناوگەڵ: نێو گەل.

ناوگێر (بار.): ناودێر.

ناولەپ: نێودەست.

ناولنگ: ناوگەل، نێوانی دوورانی مرۆڤ.

ناولنگانە: ناوە.

ناوماڵ: نێوماڵ.

ناومل: ناوشان.

ناومیری (دەر.): نێوداری مەشکە.

ناونان: ناولێ نان، ناو دانین.

ناوناوە: نێونێوە.

ناونجی: نێونجی، ناونگی، ناوەندی.

ناونووس: نووسینی ناوی خەڵک بە مەبەستێکی تایبەتی.

ناوێزە: پرپرس، (باک.) زیاکەر، فیخوورجۆ، ناشنا، جەرگهەلیین، سۆزرەت. تاک، نەبهیستی، نەبیستراو، پرپرس، ناشنا، جەرکهەلیین، چاڤ زیلک، سۆسرەت، سۆزرەت.

ناوێژە: ناوێزە.

ناوێژک (کە.، ڕۆژ.): دار دۆژەنگی مەشکەی.

ناوبیت (ڕۆژ.): تابووت، بێ فەڕ، ناشرین.

ناووگ: ناوەندی، ناوەنجی.

ناووک: نافک، ناوکی ناو مێوە.

ناووناتۆرە: ناورونرتک.

ناوونرتک: ناوروناتۆرە، نێوونرتک.

ناوونیشان: نێوونیشان.

ناوهاتوو: ئەوەی، کە ناوی براوە.

ناوێ: نابێ.

ناوین (باک.): میاوەمیاو.

ناوبیت (کە.، ڕۆژ.): تابووت، ناشرین.

ناوبیس (باک.): سارداو، سەرداو.

ناوین: ناوەند، ناوەڕاستینە.

ناهەموار: نالەبار، گێژ، پۆپ، (هکا.، باک.) نافرەجا. چەپرەک، چەپلەر، ناهەنجار.

ناهەنجار: ناهەموار.

ناهومێد: بێ هێڤی، (باک.) نەومید، نائومێد. ـــ ی: بێ هێڤیتی، (باک.) نەومییدی، نائومێدی.

ناهید: ئەستێرەیەکە، زوهرە.

نای (باک.): بلوێر. (هەورا.) دۆڵاش.

نایاب: زۆرچاک.

نایژەن (باک.): بلوێر لێدەر.

نایی: ناهید.

نە: بۆ یەکخستن و نەهێشتن، نا، نـە، نەخێر، ج، چا، (برا.، خۆ.) نەو. نەکەی، نەڕۆی، نەڕوا. (بار.) ناو، هەء، چوو، چوء. (کەل.) لە: نەتۆ: لەتۆ. (هەورا.) دە، دەنێو، لە: نەگوڵشەندا: لەگوڵشەندا.

نەء: ها، هیء، نا، نە، چە، چوا، ناو، (برا.، خۆ.) نەو، چوو، چووء.

نەءنەء: نانا.

نەبا (هەورا.، موک.): نەوەکو، نەک.

نەبات: شەکری نەبات. ـــ ی: ڕەنگی نەبات، سپات.

نەبادا: نەوەکوو.

نەباش: خراپ.

نەبان: مێژووک (مێژمێژووک (مەهاباد))، نەواوون. (هەورا.) نامۆ. زیز، ناساز، ناتۆگر، تۆراو، تۆریاو، پتر بۆ گوێلک و پالاخ و کارو بەرخان بەکاردەبرێ. ـــ ی: نامۆیی، تۆران.

**نەبانۆک** (باک.): کەسێکە نەبیینرێ، نادیار.

**نەبانی:** نامۆیی، ناکۆکی، ناکۆکێتی.

**نەبایە** (موک.): نەبووایە.

**نەبەرد** (هەورا.): شەڕ، جەنگ.

**نەبەز:** ئاوەسوو.

**نەبەکار** (باک.): ژنی بەدخوو.

**نەبەکام:** ئەو بەرە (فەرخە)یە کە ماڵات لەپێش کاتی خۆیدا بیهاوێ.

**نەبڕ:** لوول، لـۆل، سوواو، کـەرخ. تیبیغێکـە کـول بێ و چی پێ نـەبڕێ. دەسەڵاتدارێکە کاری لەبەر نەڕوا و فەرمانی سست بێ.

**نەبڕان:** نەپسان. شتێک، کەنەبڕدرێ.

**نەبڕاوە:** بێ کۆتایی.

**نەبزۆک:** نەجولاو.

**نەبۆڕ:** کەسێک، کە بۆڕنەدرێ، !

**نەبوو:** هەژار، دەست کـورت، بـێ سـامان، بـێ دەسـت، ڕەش و ڕووت، نـەدار، لێکـەوتوو. تـەفروتوونا: تەرتەوەرتـە، تـەرتوو توونـا. نـەبوون، لەنێوبراو. ـــ بوون: تەفروتوونا بوون، تەرتەوەرتە بوون، تەرتو توونـابوون. ـــ کردن: تەفروتوونا کردن.

**نەبوون:** نادارابوون، نەداربوون، مـردن، لـەنێوچوون، نـەینی، ڤـت. ـــ ی: ناداری، نەداری، نەبوونی.

**نەبوویی:** نەبوونی.

**نەبیرە:** کوڕی نەوەیەس.

**نەبینی:** کوێر.

**نەبیستی** (باک.): نەبیستراو، ناوێزە.

**نەبیرانی** (باک.): ناسازی کە لەبەر ئاوسی بێ.

**نەپا:** نەپایەدار.

**نەپاندن** (باک.): پەنهان، شاردنەوە.

**نەپەرووشک:** چەنگاڵ، پەنجەی پێی جانەوەر و باڵندان.

**نەپهەندی** (باک.): چۆل، دەشتی چۆل.

**نەپیو** (دزە.): جێگایەکە لە چۆم و ئی دی کە پانەدا.

**نەتانین:** نەتوانین، پێ نەکران.

**نەتە:** پاشەکەوت. ـــ کردن: پاشەکەوت کردن.

**نەتەوە:** نەبیرە، نـەڤیچرک، نـەڤیچییرک. ـــ پەرست: ئـەوەی نـەتـەوەی خـۆی تـا ڕادەی نزیـک لـە پەرسـتن خـۆش بـوێ. نەتەوەپـەروەر. ـــ یەکگرتووەکان: ڕێکخراوی جیهانی نەتەوەکانە.

**نەتەوایەتی:** بیری نەتەوەپەروەری.

**نەترس:** چاو نەترس، کەسێک ترسی لە دڵدا نەبێ، ئازا، بوێر.

**نەتراندن** (باک.): بنەترینە، دڵدانەوە، تەسکیندان.

**نەترە** (موک.): هەترەش، (خۆ.، دزە.) زەندەق.

**نەترک** (بابا.): گوڵ.

**نەترین** (باک.): تەسکین بوون، بنەترە، ئارام گرتن، دڵدرانەوە.

**نەتڵ:** دوژمن، نەیار، دژ، ناحەز.

**نەتۆرە** (موک.): ناتۆرە، ناوبانگی خراپ.

**نەتووکەس** (باک.): ناکەس، بەد ئەسڵ، نائینسان.

**نەجمیین** (بت.): بنەجمە، شەلیین.

**نەجیین** (بت.): پەرۆشدار، داماو، خەمناک.

**نەچار:** ناچار.

**نەچاری** (بت.): ناچاری.

**نەچم:** بێ جووڵە، وەستاو.

**نەچیر:** ڕاو. ـــ وان: ڕاوکەر.

**نەخازم** (باک.): بەتایبەتی.

**نـەخت:** کـەم، جـک، هێنـد، تـۆز، بـڕ، پـت، پـچ، پـرت، قـاس. ـــ ێـک: کەمێک، پیتێک، بڕەک، کەمەک، (بت.) گـەردێک. پچێک، پرتێک، تۆزێک، خیبچە، دەنک، (باک.) قیبچکۆک.

**نەختە:** زۆر، ئێگجار زۆر، تەنیا بۆ بارانە بەکاردەبرێ.

**نەختەنەختە:** کەمکەمە، بەرەبەرە، لەسەرەخۆ، پێچ پێچە.

**نەخت نەختە:** کەمکەمە، تۆزەتۆزە، بڕبڕ، بڕەبڕە.

**نەختێ:** تۆزێ، کەمێ، پیبچێ، چەلێ، کەمەک، کەمێک.

**نەخری** (باک.، بن.): نۆبەرە، نۆبەرەی منداڵانە لە نێرو مێ و بۆ میوە. ئایانی ڕۆژ.

**نەخریینی** (بت.): خورێنی، بەخورێنی.

**نەخشکار:** هونەرمەندی نەخش و نیگار.

**نەخش:** زجێف، نەقش، وێنەی ڕەنگاوڕەنگ.

**نەخشاندن** (کۆ.): ئازما.

**نەخشاو:** چتی بەنەخش، نەخشکراو، ڕەنگین.

**نەخشە:** نەقشە، نوقلانە، نەقلانە. ـــ لێدان: نوقلانـەلێدان. ـــ ی پلان: نەخشەیەک، کە بۆ پلانێک دانرابێ. ـــ ی خراپ لێدان: پێ هەڵکالان، نوقلانەی گەند. ـــ ی چاک: نوقلانە.

**نەخۆشەڤان** (بت.): نەخۆشەوان.

**نەخشی توویلێ** (جا.): نێوچاوان.

**نەخشین:** ڕەنگین، ڕەنگاوڕەنگ، خۆدل، دەلال. نێوی ئافرەتانە.

**نەخوار بار** (باک.): نەخواردەنی.

**نەخوازە:** نەخوازەلا، نەمازە.

**نەخوازەلا:** بەتایبەتی، نەخوازا.

**نەخوازەلە:** نەخوازە.

**نەخوە** (باک.): نخۆ، دەنا.

**نەخوەش** (باک.): نەخۆش. (باک.) ـــ ی: نەخۆشی.

**نەخۆ** (دەر.): دەنا.

**نەخۆر:** بەرچاوتەنگ.

**نەخۆش:** ناساز، نەساخ، نەوەش. ـــ بوون: ـــ کـەوتن. سـەری ـــ دان: بۆ لای نەخۆش چوون. ـــ کەوتن: نەخۆش بوون. دییەدەنی نەخۆشان: سەر لـە نەخۆش دان، چوونە لای نەخۆش.

**نەخۆشەر** (سەوە.، هە.): لەپە.

**نەخۆشەوان:** دەرماندار، تیمارەوان، تیمارگەر.

**نەخۆشخانە:** تیمارخانە، خەستەخانە.

**نەخۆشگەری:** بیمارستان، تیمارستان.

**نەخۆشی:** ژەهری، ژەهرەک. لە ـــ راست بوونەوە: چاک بوونەوە لە نەخۆشی. لە ـــ چاک بوونەوە. ـــ ی نیشتەنی: ئەو نەخۆشیانەی لە ناوچەیەکدا یان شوێنێکدا بڵاون.

**نەخۆشییەکانی شیینایی:** ئەو نەخۆشیانەی تووشی بەروبوومی کشتوکاڵ دەبن.

**نەخۆشیین:** نەخۆستی.

**نەخوێندەوار:** کەسێک، کە خوێندەواری نەبێ، بێ سەواد. ـــ ی: بێ سەوادی.

**نەخێر:** نەءئەء، ناء، چووچووء.

**نەدار:** نەبوو، لێکەوتوو. ـــ بوون: نەبوون. ـــ ی: لەخۆگرتن.

**نەدرڤان:** نەدروان، نەردیوانی دارو ئیتر.

**نەدیار:** نادیار، بزر، گوم.

**نەدیتکە:** نەدی و بدی.

**نەدییتی** (باک.): نەدیتکە، نەدی و بدی.

**نەدییە:** نەوەی نەوەیە.

**نەدییو:** دەرکەنار، (هـ.، زەن.) پیوار، نادیار، پۆشراو، جێگای ون و دوور لەبەر چاو.

**نەدی وبدی:** (هەورا.) نەدیتکە.

**نەڕاست** (باک.): ناڕاست.

**نەڕاندن:** گوڕاندن، شیپڕاندن، قیژاندن، بەسەردا هاوارکردن. ـــ ی شێری (مڕە، هاوارکردن).

**نەرتورتی** (باک.): زوور، زبر، سەخت.

**نەرە** (هـ.): داربەڕوو.

**نەڕە** (نەڕەنەڕ): دەنگێکی زۆر بڵند و بەهێز، نەعرەتە نیپڕە، مۆڕی، قیژە، هاوار، شیپڕە. ـــ ی شێری: ئەرین، (باک.) ئەریین.

**نەڕەنەڕ:** دەنگی شێری و پیاوانە، گوومگووم، گوومین، مخین، لەکاتی تووڕەیی و کوژراندا، قیژەقیژ. ـــ کردن: نیپڕاندن.

**نەرد** (هـ.): تاوڵە، تەختەنەرد، بەخت. ـــ ی نوستووە.

**نەردەوان:** نەردیوان.

**نەردێن:** گەمەی نەردی.

**نەردیوان:** (باڵ.) پێ پلەکان، پەیژە، پاپیلکە، (هۆرە.) پەرییز، پاچیینە، (ڕۆژ.) پاپاچیینە. پەیجە، (هـ.) سردی، (قەرە.) پێ پەیژە، پێ پیلکە، (ژا.) سترد، (زی.) سترده، (باک.، لک.) نەردەوان، پیپسی برک، (باک.) مەردیوان، (هـ.، دزە.) میردەوان، (ئامێ.) پرییسکە، (وا.) نەردڤان. ـــ دوومەر: (باک.) پێکەهە.

**نەرگس** (هەورا.): کلینجکی مەڕی، نێرگس.

**نەرگسەجاڕ:** نێرگستان.

**نەرم:** شل، شلک، (باک.) تەڕ، حیپپ، مژۆک، (باک.) بۆڤل (بۆ گوش). ـــ بوون: چتی ڕەق دە ئاوێدا خوسان. ـــ کردن: نماندن، لەخووس نان. زەلیین، نەرمژاندن.

**نەرمان:** پارچە زەوی یا ڕێگایەکە خییزو بەردی کەم بێ و نەرم بێ.

**نەرماڤ:** نەرماو.

**نەرماو:** نەرماڤ، ئاوی هێدی.

**نەرمایی:** ئەو لبادەیەکە دەکەوێتە سەر کەفەڵ و پشتی زین.

**نەرمە:** گۆشتی نەرمە، گوولە، نەرمک.

**نەرمەبارانە:** بارانێکە لەسەر خۆ بباری.

**نەرمەزین:** سەرکەفەل، پاش تەرک.

**نەرمەنێشک** (باک.): سازگار.

**نەرمەپێکەنین:** زەردە، زەردەخەنە، بزە.

**نەرمەساو** (بابا.): بڕندە، بڕپەند.

**نەرمژاندن** (باک.): بنەرمژیینە.

**نەرمەلانی:** قەد پاڵی گرد و کێوان یا دەشتێکی بێ بەرد و نەرم.

**نەرمەکۆخە:** کۆکەیەکی کەم، نەرمەکۆکە.

**نەرمەی ڕان:** شڵکەی ڕان، نەرمە گۆشتی ڕان.

**نەرمەی گوێچک:** بەشی خوارەوەی گوێ، کە نەرمە گۆشتە، ئەو بەشەی نەرمە گۆشتەی خوارەوەی گوێیە، کە ئافرەتان کونی دەکەن و گوارەی پێوەدەکەن.

**نەرمک** (باک.): گۆشتی نەرمە.

**نەرمۆک** (باک.): قەڵەو پڕ.

**نەرمۆڵ:** نەرم وشل. زۆر نەرم، نێوی ئافرەتانە.

**نەرم وشل:** نەرم ونۆڵ، نەرمۆڵ.

**نەرم ونۆڵ:** نەرم وشل.

**نەرمی:** نێوی ئافرەتانە، میهرەبانی.

**نەرمیین:** نێوی ئافرەتانە.

**نەرێ:** نا.

**نەرییت** (بابا.): شێوە، خوو و ڕەوشت ڕێکی. ـــ کردن: بەسەروبەرکردن، (باک.) سەروبەر، سازکردن.

**نەریمان:** نێوی پیاوانە. (هەورا.، کۆ.) زگ.

**نەزار:** نزار، نسار.

**نەزان:** ناشی، نیازان، سوانەوێڵە، نەدان، (ڕەوا.) نەشکەفتە، گەوج. ـــ ی: نیازانی، (باک.) بێهایی. بە ـــ : خۆتەن.

**نەزانیین:** دژی زانین. شارەزا نەبوون لە شتێکدا.

**نەزاو:** لەدایک نەبوو، مێیینەیەکە، کەمنداڵی نەبووە.

**نەزر:** لەخۆگرتن، نەدر.

**نەزڵە** (هەورا.): شوارۆ، نەزم، شوار.

**نەزم:** ـــ ی موسیقا: پەردەی مۆسیقا، پەردە، هەوای تایبەتی بەندو گۆرانیان، ئاهەنگ، چەشنی مەقامان، وازی، بڵند. ـــ بوون. ـــ کور.

**نەزم زان:** پەردەناس (گۆرانی و مۆسیقا). ــ ی: پەردەناسی. مقام شوناس.

**نەزمی:** ــ کەر: شوارۆ، نەزڵە. ــ گرتن: نەزڵەگرتن. ــ لێدان: بلندایی دەمار.

**نەزۆک:** پیچەڵ، (موک.) ئەوەی کە نەزێ (منداڵی نەبێ). ــ ی: پیچەڵی.

**نەزێ:** بڕوانە: نەزۆک.

**نەژاد:** نژاد، نژار، دامار، دییدمان، ڕەچەڵەک، بنچیینە، بنج، (باک.) جەڵەب، نێوی پیاوانە.

**نەژراندن** (باک.): ناژتن، ناشتن (بنەژریینە).

**نەژادی:** بنچینەیی، نژادی.

**نەژد:** سیس، ژاکاو، چرچ بوون.

**نەژنەوا:** بێ گوێ.

**نەساخ** (باک.): ناساخ، نەخۆش. ــ کەتن: نەخۆش کەوتن. خۆ ــ کردن: خۆ نەخۆش خستن بە ئەنقەست.

**نەساز:** نەخۆش، نەساغ. کەسێکە، کە لە گەڵ دەوروبەر نەگونجێ.

**نەستەق:** قسەی ــ : قسەی ڕەق. ڕاست، دروست.

**نەستەق کردن:** فەلاقەکردن.

**نەستین** (باک.): زیان، ئازار.

**نەسرەوت:** بێ ئارام، بزۆز، نیگەران.

**نەسرین:** ناوی جوورە گوڵێکە، ناوی ئافرەتە.

**نەسکەنە** (کە.، ڕۆژ.): قەڵەمی ئاسنییە، بەردو داری پێ دەکۆڵرێ.

**نەسۆز:** هەر شتێک، کە نەسووتێ.

**نەسوو:** ئەو تیغەی، کەلە کانزایەک دروست کراوە، تیژ نابێ، ناسوێ.

**نەشارەزا:** کەسێک، کە شارەزا نەبێ، نابەڵەد.

**نەشئە:** کەیف.

**نەشتەر** (باک.): نشتەل، نیشتەر. ــ دان: نەشتەری دان.

**نەشتەرچی** (باد.): خوێنبەر دەر.

**نەشڵە** (کە.): زریزە نشتووە، بە چەند نشتوێکی دەڵێن کەوا تێکخرابێ.

**نەشم:** کەسم، چەشن، ئێسک، (باک.) ئازیین.

**نەشمیل:** جوان.

**نەشمیلە:** خنجیلە، قشتیلە، جوانکیلە (بۆ ئینسان و حەیوان).

**نەشۆر:** بڕوانە: نەزۆک.

**نەشوونما:** زاخاو، جیلوە. لە ــ کەوتن: کنانەوە، هەڵنەدان.

**نەشیڤ** (باک.): نشێو، سەرەوخووار، سەرەوژێر.

**نەعرەتە:** نەڕە، دەنگێکی زۆر بڵندو بەهێز.

**نەعنا** (موک.): گیایەکی دەشت و کێوییە، بستەو نیوێک بڵند دەبێ و گوڵی سپییە گەڵای درێژۆکەو کەمێک باریکەو بۆنی خۆشە بۆ کفتە باشە. ئارەقی نەعنا بۆ سەرئێشەو زگ ئێشە.

**نەغد:** پارە، نەخت، پێچەوانەی قەرز.

**نەغدە** (ش.): کەللە، شاخ، نەغدەیەکی بەهێزی لێدا: کەللە یا شاخێکی بەهێزی لێدا.

**نەغمە:** بنچیینە، بناغە، گەوەڕ. ــ ی دیواری.

**نەفاچل** (باک.): بەدخوو، بەد ڕەوشت، ڕەوشت سووک.

**نەفام:** نەزان، شوانەوێڵە، ئەشکەفتە.

**نەفەڕە** (ڕەوا.): گیایەکە جوورە سیوەڕەیەکە توولەشی دەئاوێ و لە نێزیک سیوەڕەی دەڕوێ.

**نەفەک** (هەورا.): نیفەک.

**نەفەل** (بار.، گەر.، باک.): جوورە سیوەڕەیەکە توولەشی داوێ، (ڕەوا.) نەفەڕە. (باک.) گیایەکی سێ پەلکە.

**نەفت:** نەوت، دژناگازی.

**نەفتاوی:** نەوت پێوە نووساو، تێکەڵ بوون بەنەوت.

**نەفتخانە:** نەوتخانە.

**نەفتک** (باک.): شەمچە.

**نەفداندن** (باک.): ڕزگارکردن، بنەفدیینە.

**نەفدین** (باک.): ڕزگاربوون، بە ئامانج گەیشتن.

**نەفرین:** بیزو بۆ پووشل.

**نەفسکە** (کە.): چڵێس، نەوسن.

**نەفسی** (باد.): زڕکوڕ، زڕکچ.

**نەفەکری** (باک.): بەیار، ناڕێک.

**نەڤچییتی** (باک.): بەهۆی.

**نەڤ** (باک.): قووڵایی، ڕاوەماسی.

**نەڤاندن:** نقەکردن، بژارتن، جوورە زگچوونێکە.

**نەڤجار** (باک.): نەوە.

**نەڤیچرک** (باک.): نەڤیپچیپچرک، نەتەوە (منداڵی نەوە).

**نەڤیچییرک** (باک.): نەتەوە.

**نەققە:** ماسی زۆر گەورە.

**نەقەنەق:** نکەنک.

**نەقلانە** (هەورا.): نەخشە.

**نەقۆ** (شەم.): ئێستا، هەنووکە.

**نەقیزە:** زەختە، پیرەسی. سەری ــ گەیاندنەولاخان: تێ وروورژاندن.

**نەقییم:** نقێم، نقییم، قاش.

**نەک:** نەوەکوو، نەبادا، نەوەک، نەبا، نەکوو، نەک.

**نەکاری** (باک.): ناتوانا.

**نەکاو:** ناکاو، پڕ، نشکوە، یانی. لە ــ : نیشکڤە، لەناکاو، کوتوو پڕ، لەپڕ، کوتومت، لەپڕڕا، ناکام.

**نەکەپووز** (باک.): (مەحجوویە، مەستوورە) بۆ (ژن)، زەخییرەکردن، قەیدکردن، پاشەکەوت.

**نەکەس** (باک.): دەردی ئەعصاب، ناکەس، پەست، دەن. ــ ی (باک.): ناکەسی، پەستی، دەنیەتی.

**نەکراندن** (باک.): دەنگی ئەو باڵندانەیە کە بە شەو دەگەڕێن.

**نەکردن:** ئەنجام نەدانی کارێک.

**نەکلاندن** (باک.): داخستن، پێوەدان، پەستی (بنەکلیینە).

**نەکوو:** نەک، نەوەک، نەبادا.

**نەکێش:** نەگەیەنەر (لەفیزیکدا)، چاوچنۆک. ڕژد.

**نەکێشان:** سەرپێچان، بەزاج، شۆڕش، لامۆفەک.

**نەگبەت:** هۆڵ، شووم، نابووت، قەشقە، نەگریس، نەهات، بیوڵەت، بێوەڵەت. ــــ ی: کارەسات، چوورتم، رووشتە، نەهاتی، نشسواف، نشییف.

**نەگرییس** (هەورا.، جا.): نەگبەت، سەهندە.

**نەگۆمە:** بێ توانا، خۆنەگرتوو.

**نەگۆڕ:** چەسپاو، ئەو شتەی یا ئەو کەسەی کە ناگۆڕدرێ.

**نەگوهداری** (باک.): گوێ نەدێری.

**نەگهیی** (باک.): نەگەیشتوو (مییوە).

**نەگیریاگ:** نەگیراو.

**نەڵ** (شا.): قامیشەلان، قەمیشەڵان.

**نەڵێن:** چۆمێکە لە مەیدان بەڵە کیوە دێتە خوواری بەنێو مەنگوراندا تێدەپەڕێ لە (باریی بێ خێرێ) تێکەڵی لاوێنێ دەبێتەوە.

**نەڵییوان:** دێیەکە لە دەشتی شنۆیەیە بەو چۆمەش دەڵێن کە بەوێدا تێدەپەڕێ.

**نەمازە** (باک.، باد.): تەنانەت، نەخوازەلا، بەتایبەت.

**نەماگ:** نەماو.

**نەمام:** تورل، (ڕۆژ.) داری ساوا، ڕییشەیەکی چەقاوە کە خۆی گرتبێ، توویل، شەیبوک.

**نەمان:** پایەدار نەبوون، بزربوون، تێداچوون، قت، قتی، (هەورا.) نەبان.

**نەماو:** نەماگ، لەناوچوو، تەواوبوو.

**نەمە** (دا.): لباد، نمەد.

**نەمەد:** لبادی ژێر رایەخ، کە لە خوریی پەستراو دروست دەکرێ.

**نەمر:** جاویید، هەمییشە زیندوو، (باک.) گیایەکە.

**نەمروو:** ڕیزە شاخێکە لەلای چەپی گۆمی وانییە.

**نەمری:** زیندوویەتیی، هەمیشەیی.

**نەمل** (هەورا.): لباد.

**نەمیانەوە:** چەمانەوە، نووشتانەوە، داهاتنەوە.

**نەمێر** (باک.): ناپیاو، بێتاقەت.

**نەمێرد:** نەنێرو نەمێ، نێرەمووک.

**نەمیین:** غەدار.

**نەن:** نەنک، داپیر.

**نەناس** (کە.، باک.، موک.): ناشناس، کەسنەزان.

**نەنەسراو:** نەناس.

**نەنک:** دادا، پییرەدا، (باک.) پیییرک، (خۆ.) نەن، (ڕەوا.، لو.) داپییر، (زاخ.، ڕۆژ.) پیییر، (هەورا.) ماما، دایکی دایک و بابە، مامە.

**نەنگ** (باک.، کە.): نێوونرتک.

**نەنگ نامە:** نووسراوی ناو زڕاندن.

**نەنگیین:** کاری شوورەیی.

**نەو** (برا.، خۆ.): نەو، نە، نا، نوویی تازە. (فە.) لباد، نمەد.

**نەوا:** داڵدە، (دزە.، ڕەوا.) نووان، نەوا، ئارامگا، ئارامگە، (هەورا.) نەوەکوو. نەواتێکچوو: هێلانەدانە.

**نەوات:** بروانە: نەبات.

**نەوار:** پارچە شریتی تەنک. بافتەیەکی تەنکە کچان پرچی پێ دەبەستن. (قردێلە).

**نەوارتن** (ڕۆژ.): هەویر هەڵنەهاتن.

**نەواڵ** (باک.): جێگای نزم و نەرمە، نەورالی، نەورانی، ناڵ، نەور، نووهاڵ، نهاڵ، شف، شییف، دەرە. نەرمەلانی قەدپاڵی چیا و گردانە، هی پڕ لەگیاو ئاوییشی دەبن دابێ: (جەلال)ی پێ دەڵێن.

**نەوالخ** (باک.): زۆر بلێ، چەنەسوک.

**نەوالۆک** (باک.): نەواڵی چکۆڵە.

**نەواوون** (کە.): نەبان، مەڕ، بزن، مانگایەکە، کە بێچووی خۆی نەدی و نەیلاوێنێتەوە. ــ ی: نەبانی.

**نەوە:** نەوکی، (باد.) نەڤی، (هەورا.) پێش. ڕۆڵەی نەتیژەیە، ئەویش ڕۆڵەی نەدیدەیە، ئەویش ڕۆڵەی نەبیرەیە.

**نەوەد:** نۆهەد، نەهوێت، نۆت، نۆ جاران دە (٩٠) نۆد.

**نەوەرد:** دارێکی چوار پاڵووی پشت ئەستوورە جۆلاَ تەنراوی لەسەر هەڵ دەکا. نەبەرد.

**نەوەش** (ژا.، هەورا.): نەخۆش.

**نەوەک:** نەوەکوو.

**نەوەکو:** نەبا، (هەورا.) نەبادا، نەکوو، مەبادا، نەک، نەوا، نەوەک.

**نەوەن:** بروانە: شاتر.

**نەوەند:** گرێلکی یەک ساڵانەیە، یەک بەند، گیای تازە جووتە، نۆبەند.

**نەوت** (باک.): نەفت، تەگبیرکردن. (باک.) ــ ی: جوورە گۆرانییێکە.

**نەودەم:** تازە پێگەیشتوو. ــ ی: تازە پێگەیشتوو.

**نەور** (هەورا.): نەواڵ، نزم، نەوی، نەرم، بۆ جێگایەکی دەبێ کە نزم و نەرم بێ.

**نەوراتن** (ڕۆژ.): هەڵنەهاتن بۆ هەویرو ڕۆژ.

**نەورانی** (هەورا.): جێگای نزم و نەرمە، نەورایی، (کە.) نەواڵ.

**نەورایی** (هەورا.): جێگای نزم و نەرمەو سەرەوژێر لە دەشتاندا، نەورانی، (هەو.) نەواڵ.

**نەورانەوە** (هەورا.): پاڕانەوە، لالانەوە.

**نەورانەنەوە:** پاڕانەوە.

**نەورۆز:** جەژنەی سەری ساڵە لە کوردستاندا، ناوی یەکەمین مانگی بەهارییە، لە نەورۆزێدا دەڵێن کە (زوحاک) گیرا جەمشیید کرا بە پاشا، هێندێکیش دەڵێن فەرەیدوون کرا بە پاشا، ناخەلیوە، خاکەلیوە، ناخلیف، نادار، مارت، نێوی ئافرەتییە، (باک.) نادارۆک. ناوی مانگە

کوردییەکانی ئەمانەن: نەورۆز، گولاڵ، جۆزەردان، پووشپەڕ، خەرمانان، گەلاوێژ، ڕەزبەر، خەزەڵوەر، سەرماوەز، بەفرانبار، ڕێبەندان، ڕەشەمە.

**نەورۆزانە:** باجێک، کە لە نەورۆزدا وەردەگیرا (کۆن)، خەلاّتی جەژنی نەورۆز.

**نەورۆزنامە:** نووسراوێک، کە باسی لەبارەی نەورۆزی تێدا کرابێ.

**نەورۆڵی:** هۆزێکی کوردە لە جافانە لە دەوری هەڵەبجەو لە شارەزوور دادەنیشن.

**نەوری:** ناوچە زەوییەکی نزم و نەواڵ و نەرم.

**نەوزاد:** نێوی نێرینانە.

**نەوس:** گوویان، لرین، نەفسکە، زگەڕۆ، چاوبرسی، کاسەلێس، چاونزار، چاونزیر، چەڵماس، (کە.) کەسێکە بە شوێن خواردەمەنی داراندا زۆر بگەڕێ. چاوچنۆک، چلێس، (باک.) چل.

**نەوسنی:** کاسەلێسی.

**نەوسی** (شەم.): زرکوڕ، زڕمنداڵ.

**نەوک** (فە.): نێووک، (باک.) کەڵەکە.

**نەومێید:** ناهومێد. ـــ ی (باک.): ناهومێدی.

**نەووەهار:** (هەورا.) نەوبەهار.

**نەوهاڵ** (هەورا.): نیهال، جوان، جحێل.

**نەوهاڵ:** لاو، گەنج.

**نەونەو** (باک.): میاومیاوی پشیلە.

**نەوێر:** ترسەنۆک.

**نەوو** (ڕۆژ.، دا.): غەد، لباد، ئەو ڕایەخەیە کە غەد ماڵ لە بەرگی دروست دەکەن.

**نەوێرۆک:** ترسەنۆک، (باک.) نەوێرەک. ـــ ی: ترسەنۆکی.

**نەووو** (جاف.): ڕاییخ.

**نەووگ** (شارە.): لباد.

**نەوێس:** نۆزدە. بزۆز و ئۆقرەنەگر.

**نەویی:** هەژان، نشێو، نقر، نزم، نەور، (باد.) نەوە.

**نەوین** (هەورا.، شا.): نزم بوون، تێ ڕژهاتن، گرتن، پردان، ڕەتدان. لێ ـــ: پردان و تێ ڕژهاتن. نانەوی: نزم نابێ. ـــ ی: نزمی

**نەه** (هەورا.): نێوک، ناوک، (باک.) نۆ، بەدفەڕ.

**نەهات:** نەگبەت، ڕووت. ـــ ی: نەگبەتی.

**نەهار** (ڕۆژ.، کە.): خەفەت، داخ، ڕق.

**نەهارزگ** (کە.): خەفەتبار، ڕقدار.

**نەهەڤگرتی** (باک.): تێکەڵ وپێکەڵ.

**نەهەنگی دەریایی:** گاماسی، حووت.

**نەهەنگی ووشکانی:** تیمساح.

نەهەنگی ووشکانی

**نەهتن** (باد.): هەڵبەست هۆنینەوە.

**نەهشیین** (باک.): بێ هۆش، بێ عەقڵ.

**نەهگوون** (باک.): نینگوین.

**نەهنگ** (باک.): شەڕانی و شەڕپەرست.

**نەهێشتن:** بەر برینەوە، پێش گرتن، پەکخستن، بەر هەڵست کردن.

**نەهویت** (باک.): نەوەد.

**نەهۆ:** ئێستا.

**نەهێرو:** بەرگر، پێش گر.

**نەهێز:** پەک خەر، قۆرت، پێشگر، بەرگر، نەهێل.

**نەهێل:** نەهێز.

**نەهێشتنی جانەوەران:** لەنێو بردنی جانەوەران.

**نەهێنی** (بابا.): نیهانی، ڕاز.

**نەهییتە** (باک.): تازا، باش.

**نەهیین** (باک.): پارچە، کالاّ.

**نەی:** نای، بلوێر، (کە.) قامییش، (هەورا.) دەزوو، زەمۆرەکی ئاشی، (هەورا.) نێ ئاساو.

**نەیار:** دوژمن، خەنییم. ـــ ی: دوژمنی، دوژمنایەتی.

**نەیارای:** نەیاڤارای، (هەورا.) نەوێران.

**نەیارێتی:** دوژمنایەتی.

**نەیاوای** (هەورا.): نەگەیشتوو.

**نەیەکسان:** یەکسان نەبوون، لێک جودا.

**نەیجە** (هەورا.): قامییش.

**نەیرڤان** (باک.): گرژ، چاودێر.

**نەیرین** (باک.): بنەبییر، نۆڕیین، (باک.) تەماشاکردن.

**نەیژەن:** بلوێر ژەن.

**نەیلە** (فە.): قامییش.

**نەینک** (باک.): بڕوانە: ئاوێنە.

**نەینۆک** (هەورا.): ئاوێنە، (باک.) نەینک.

**نەینووک** (باک.): نیینۆک.

**نەیین** (باک.): قت، نەبوون.

**نتک:** (شو.، ڕۆژ.) نوختە، پەڵە. ـــ ی ڕەش لەسەر چاو یا لەسەر جلەکەیەتی.

**نچ:** نووزە.

**نچاندن** (باک.): بنچیینە، پێوەدان (زیندەواران)، تووش بوون.

**نچەنچ:** نووزاندن.

**نچک** (باک.): نوختە، ئامانج. ـــ دان: پێوەدان، ئازاردان، ـــ سەرەتا: خاڵی دستپێکردن.

**نچ وناڵە:** نووزە، ناڵاندن.

**نچییر** (کە.): نێچییر. ـــ وان: ڕاوکەر. ڕاوچی.

**نخە** (فە.): نۆک.

**نخفتن** (باد.): داپۆشین، شاردنەوە. (بۆ مرۆڤان نابێ).

**نخاندن:** گەرم داپۆشینی نەخۆشانە.

**نخای** (باک.): بێ شەرم. (باک.) ـــ ی: بێ شەرمی.

**نخۆ:** دەنا، نەخێ، نەخوە.

**نخووت** (فه.): نخیّ، نۆک.

**نخوومانـدن** (باک.): بخوومیّنه، دووبارەداپۆشیین.

**نخوون**: سەرەوژێر.

**نخویین** (باک.): نخوون. ــ کرن: سەرەونخوون کردن.

**نخیّ** (شو.، فه.): نۆک.

**نران**: دانران. ــ موه: دانرانەوه.

**نراوه**: دانراو.

**نرتک**: نیّوونرتک. ــ بیّژ: هەجووکەر.

**نرخ**: مز، مەزەنده، بەها، مەزنده، بایی، خاراج، خەراج. بە: (باک.) کرییژۆک. بیّ ــ : (باک.) پیپژپییژه (سووک)، پووچ، بیّ تەشه، پووت. تەوش، ناتۆره. ــ بۆ دانان: دەستنیشان کردنی نرخی شتیّک. ــ کردن: مەزەندەکردن.

**نرخاندن**: نرکاندن.

**نرخه** (که.): نرکه.

**نرخەنرخ**: نرکەنرک.

**نرخ برین**: دانانی نرخی دواییی شتیّک.

**نرخدار**: هۆگ، میّرخاس، کۆڤییک، گرانبار، هیّژا، گران، گران بەها، بەنرخ، بەهادار، پربەها، گرانمایه، ناگۆره. ــ ی: میّرخاسی.

**نردوو**: ــ ه نان نووردە، نووردوو. مووچەنان، نووردی.

**نرقه** (رۆژ.): نرکه، نکه، دونگی، نەخۆشییه.

**نرکاندن**: نرخاندن.

**نرکه**: لەکاتی کەوتندا ــ ی لیّوه دیّ، نرخه، نرقه، نزده. ــ هاتن. (که.) نکه.

**نرکەنرک**: نکه، نرخەنرخ.

**نزا** (هەورا.، ع.): تکا، پاڕانەوه، تووک، دوعای خراپ، سینگ لیّ کوتان. ــ کردن: بەلّسیین.

**نزار**: نیّلّ، خۆرنەوەزان، سەهەند، نزارگه، سەهەن، نسار، (خۆ.) نەزار، نسرم، ئاوەژووی بەر ڕۆژێیه. لەباکووری دۆلّاندا ئەو جیّگا نزم و قوولّ و سیّبەر دارانەیه کە تاوی کەم ویّ بکەویّ و ئاوروشینایی هەبیّ یا نا. بە هەموو پارچە شینایییّکی ئاودار دەلّیّن کە بە هەر جیّگایەکی شاخان و کیّوانەوه بیّ. (شا.) بیشه، دارستان. (باک.) ڕەنگ پەرپیو، (فه.) لاواز، بیّ تین، کز.

**نزاره** (شا.): مەشکەدڕه.

**نزاندن** (که.): نالّاندن به دەنگی نزم.

**نزاو** (که.): مییز، ئاوێکه، کەمی لەبەر بڕوا.

**نزه** (باد.): سۆزەی بایه، هەناسەی بایه. (که.، ڕۆژ.) نووزه، دەنگی نزم و باریک، نزەی لیّوەدیّ: لەبەر بیّ هیّزی نووزەی لیّوه دیّ.

**نزبه** (ئامیّ.، باد.): ڕەزی دیّم.

**نزره** (که.): نرکه.

**نزم** (باد.): ئاخچەی گندۆرەو شووتی و ئیتره کە تاکتاکه میوەیشی لیّ بچیّندریّ بەلّان کە میوەکان زۆر بوون و بەرەیان ئەستان پیّی دەلّیّن (ڕەز). هەر شتیّک بەرز نەبیّ. هیچ وپووچ، پییژپییژه، پەلّپ، سووک، کەم، (باک.) گوورنەبەش، بیّ باڤ، نەزم، نڤز، نەوی، پاکوورت، تەوک، خوار، نەور، (باک.) نەزم. ــ بوون: (که.) نزمەوەبوون، هەزان، دناڤ وەچوون، نەوبین. ــ کردن: دانەواندن. خۆ ــ کردن: هیچی و پووچی، خۆ بە کەمزانین، سووکی، کەمی، ناکەسی، پەستی، بیّ باڤی. ــ زمتر: پیّشتر.

**نزمایی**: نەوییاتی، نەوییەتی.

**نزگ**: ژیان.

**نزگەره**: (ڕەوا.) بەرچییچک، بەرچییچکه، (هەورا.) بەرسیینچکه.

**نزلّه** (هەورا.، کۆ.): شوارۆ، شوار.

**نزوول** (شا.): باژەلّه.

**نزییک**: ــ کەوتن، خشانەلاوه، لەپیّش. ــ ی: نەدووری.

**نزییکایی**: نەدوورییەتی، نەدووری.

**نیزییکه**: دوور نییه.

**نزییکتر**: نیّزییکتر.

**نزییکی**: پیّچەوانەی دووری.

**نژاد** (که.، باک.): نەژاد.

**نژار**: تاریک. (باد.) نەژاد.

**نژاره** (خۆ.): بنەبانی خانوو.

**نژاندن** (باک.): بەستن.

**نژدار**: پزیشک.

**نژده** (کۆ.): جەرده، (پژ.) ڕووتکەر، (شا.) دز، ڕیّگر.

**نژدەکەر** (باک.): دزی، جەردەیی، (باک.) نژدەڤان.

**نژلاندن** (باک.): کۆکردن، لەسەر یەک دانان.

**نژلۆک**: دولّمه.

**نژوه**: ڕیّنووس.

**نژی** (فه.): نییسک.

**نسار** (خۆ.): نزار، سەهەن، (که.) نسرم.

**نسارەی ڕان** (جا.): ڕووکاری ڕانییه لەلا کییر و گونانەوەیه تا ئەژنۆیان.

**نستوو**: نوستوو.

**نستی** (باک.): بەوورشکی، بەنییشکی.

**نسرم** (که.): نزار، نسار، سیّبەرێکه، که هیچ خۆری نەبینیّ.

**نسکاندن**: هەناسەدانەوه، تاسەکردن.

**نسکه** (شا.، که.): هەنییسک، تەکاندانی دلّ لە گریانیّدا. ــ دان: هەنییسک دان.

**نسکۆ** (موک.، هەورا.): نووچ، نووچدان. هەلّەنگووتن. ــ بردن: هەلّەنگوتن.

**نسکیینه** (فه.): نزگەره.

**نسلاندن** (باک.): پالّیّوران.

**نسیّ** (خۆ.): نییسیّ، سیّبەر.

**نسیّس** (باک.): ئاوی ئاودانیّ. ــ کردن: لەپیّش کیّلّانیّدا ئاودان.

**نشادر** (باک.): گیایەکه.

**نشتەل** (باک.): نەشتەر.

**نشتوو:** (کە.) حەتۆتە، نووشتوو، قەزەمەنوشتە، جادوو، نقشتی، نقشت، (باک.) بەربەژن، حەمایەل.

**نشک** (باک.): دەمکات، ئێستا. ژ ـ اڤە: ناگەهان، لەپڕا.

**نشکۆ:** نەکاو، ناکاو، پڕپا.

**نشکۆک** (باک.): تیپی بانگ کردن.

**نشمی** (باک.): هێدی، ئارام.

**نشووف** (باک.): گێژاو، گەرداو، نەگبەتی.

**نشییف** (باک.): نشووف.

**نشێو** (کە.): نزم، لای خووارەوە، سەرەوخووار، سەرەوژێر. ـ ی: جێگای نشێو لێژ.

**نغۆری** (بار.): مەزرەق.

**نغرۆ** (نە.): نقوم. ـ بوون: نقوم بوون، ڕۆچوون.

**نفاوە** (ڕەوا.): نیشتنی قوڕاوو ماستاو و ئەستوورایی برینانە.

**نفت:** نوێ.

**نفتک:** (هەورا.، باک.) شەمچە.

**نفش** (باک.): ڕەچەڵەک، نەتەوە، هەرچاخەی نفیشێکی هەیە.

**نفوورات:** جانانە، زۆرزان.

**نقار** (باک.): تازە. ـ کردن: تازەکردنەوە. ـ ی (باک.): تازەیی.

**نقان** (باک.): هەشارگە، پەنا بەردێکە لە لێقەومانیدا خۆی تێدا هەشار بدەن.

**نقاندا** (باک.): پارێزەر.

**نقاندن** (باک.): نوواندن، (بنقیینە).

**نقەچوون** (باک.): نەوی بوون، کووڕ بوونەوە.

**نقز** (باک.): نەوی، نزم.

**نقستن** (باک.): بنقە، نووستن.

**نقسکی** (باک.): بەنووسیین.

**نقشت** (باک.): نشتوو. ـ ی (باک.): نوشتە، جادوو.

**نقشک** (باک.): ڕۆنی کەرە.

**نقییساندن** (باک.): بنقییسینە، نووسین.

**نقییسار** (باک.): دەستنووس.

**نقییسەڤان** (باد.): نووسەر.

**نقییسەر** (باد.): نووسەر.

**نقییسک** (باد.): کەرە.

**نقییسکار** (باک.): نووسار، نووسیار.

**نقییسکی** (باک.): وێژامە، وەژەگ، پەخشان.

**نقییسیار** (باد.): نووسەر.

**نقییسین** (باک.): نووسین.

**نقیین** (شکا.، باک.): نووین، ئیی نووستن.

**نقیینۆک** (باک.): دییوی نووستنێیە.

**نق:** نووقاندن، قووچاندن، پرتەو بۆڵە، قسە، گۆ.

**نقاندن** (هەورا.): نکاندن، نکەنک کردن، (باد.، بار.) چاو تروکاندن، چاوقووچاندن.

**نقە:** نکە. هەست، خوست، جووڵە.

**نقەنق:** نقە، نکەنک، لەبەر نەخۆشی یا لەبەر کۆڵێکی گران ـ کردن.

**نقم** (ڕۆژ.): نقوم، قوم. ـ بوون: لەناو ئاودا بزر بوون. ـ کردن: لەناو ئاودا بزرکردن.

**نقوورچ** (باک.): گوشین، قووڕنجان. ـ پێ دان: هەڵقورینجاندن.

**نقوورە** (باک.): چەکووچ.

**نقوورچک:** سخوولە، سووخوولە، (کۆ.) سیخورمە، سیمرخ، سووخوورمە. ـ لێدان: تێوەژاندن بەدەست.

**نقووم:** نووقووم، قووم، قوق، نقم. ـ بوون یی گەمی: بە تاراڤک، قو، قووم بوون. ـ کردن: لە ئاودا بزربوون. ـ کران: لەناو ئاودا بزرکران. ـ بوون: قووم بوون.

**نقێم** (کە.، ڕۆژ.): قاشی ئەنگوستییلە، ئەو بەردە نرخدارەیە کە لە سەری ئەنگوستییلەی دەگیرێ.

**نقییم:** نقیم، قاش.

**نک** (باک.): لا، کن، جەم، بال، ب، (باک.) نکلو، کەنار.

**نکارۆک** (باک.): زەویی قسڵدار.

**نکاری** (باک.): غەمگین، کز.

**نکاندن:** ناڵاندن، گالین، نقاندن، کسکین، نزاندن.

**نکاو** (باد.): بیروباوەڕ.

**نکە:** نقە، قنە، نرکە، نرقە.

**نکەنک:** نکاندن، نەقەنەق، نقەنق، نقەکروز، قنەقن. ـ کردن: نکاندن، نقاندن.

**نکدان** (فە.): نۆبیلکە.

**نکۆ** (ڕۆژ.): کوتکی هەللاجییە.

**نکل** (باک.): دندووک، نووک.

**نکمال** (باک.): خانووی هاوبەش.

**نکوول** (باک.): ووریا.

**نگ** (باک.): لنگ.

**نگە:** ڕق، قین. ـ لێ گرتن: ڕق لێ گرتن.

**نگرییس** (ڕۆژ.): نهێنی بڕ، ناپاک.

**نگڵ:** لووسکە.

**نگم:** بڕوانە: نقووم.

**نگیین** (ژا.): ئەنگوستیلە.

**نم:** تەڕایی، نییم، تریووس، دەلانە.

**نما:** دەرکەوت، (هەورا.) نووێژ.

**نماز** (شەب.، ڕۆژ.): نووێژ.

**نمازە** (باد.): ناوازە.

**نمان** (هەورا.): نووان، نوواندن، غموون.

**نمانای** (هەورا.): نواندن.

**نمانن** (باک.): نواندن، خاوکردن، شل کردن، نەرم کردن، بنمییینە.

**نماوی:** شێدار، غدار.

**نمە:** ــ ی باران: دلۆپەی باران.

**نمەبارانە:** ووردە ووردەی بارانە.

**نمەبۆ** (هەورا.): نابێ.

**نمەد** (هەورا.): لباد.

**نمەدماڵ:** کارگەچی.

**نمەز** (هەورا.): (بابا.) تمز، (هەو.) تومەز.

**نمەک** (لو.، هەورا.): وەفا. خوویێ. بەد ــ: بێ ئەمەک، بەترەش، ئاوان، دڵڕەش، بێ بەخت.

**نمەکدان** (فە.، موک.، لو.، هەورا.): خوێدان.

**نمدار:** نمین، شەدار، نییم دار، تربووس دار، نەمیین، هێمن، تەڕ. ــ ی: هێمینی، تەڕی.

**نمرە:** ژمارە، پلە.

**نمکانی** (ڕۆژ.، کە.): زەویی نەوی و چاڵ ونزم.

**نم نمە:** لەسەرەخۆ، کەمکەمە، تەنها بۆ بارانە، ــ دەبارێ.

**نموونە:** کەمێک لە زۆر نیشاندان، نۆرناگ، (باک.) تیپ، سەرمەشق، نمیینە.

**نمیین** (دزە.): غدار.

**نمیینە** (باک.): نموونـە. ــ کـار: نمایندە. نووێنـەر. ــ گـە (باک.): نمایشگا، نواندنگا. ــ ندە (باک.): نمایندە: نوێنەر.

**نۆ:** نەهـ. (باک.): سەخت، گرنگ.

**نۆبار** (باک.): نۆبەرە (بۆ منداڵ).

**نۆبە:** ــ کردن: سەرەدۆرکرن، نۆگە، سرە، سییرە، کژ، (باک.) سەرەدۆر، کەرەت، کایە، گەمە، چیین، نۆرە، چەل، (باک.) بەدییل، هەل، کات، چاخ. (خۆ.) ــ گە.

**نۆبەبڕ:** نۆرەبڕ، کەسێک، کە سەرەو نۆرەی کەسێکی دیکە ببڕێ. ــ ی: گەبڕ.

**نۆبەت:** ــ دار، ــ داری: چۆکداری.

**نۆبەتچی:** نۆبەچی.

**نۆبەتچییەتی:** ــ ی شەوێ کردن.

**نۆبەتی دار:** تادار، تاویی ــ داری.

**نۆبەتێ:** تـا، (هەورا.) یـاو، پـیێ. (ڕۆژ.) تـەو، سـرتمە. ــ بـڕ: تـابڕ، گەنەگەنە، کشتەک.

**نۆبەچی:** کێشکچی، نۆبەتچی، پەیا چۆکدار. چەرخەچی.

**نۆبەچێتی:** کێشکچێتی، نۆبەتچێیتی.

**نۆبەخت:** کچێکی تازە خوازبێنی کراو. تاسەکییسە، تازە دەوڵەمەند بوو.

**نۆبەخش** (کە.): بەخشیین (هاوەڵجارییە).

**نۆبەدار:** کێشکچی، (باک.) بەڵت، دییدەوان، دییدەڤان.

**نۆبەرە:** نووخووری، بەری نووێ و تازەیـە، نـەخریی، نۆییشـە، هـەوەڵ بەریی دار یا ژنانە. (باد.) خێڤە (تەنها بۆ میوەیە). ــ ی منداڵ. نۆزگە.

**نۆبەند** (کە.): گای تازە جووت. (کە.) نۆوەند، نۆبەن. (جا.) نەوەن.

**نۆپیشە** (دزە.): نۆبەرەی میوەو گیایانە.

**نۆت** (باک.): نەوەد، نەوەت، نۆهەت.

**نۆتۆرڤان** (باک.): قرەوڵ، پارێزەر. (باد.) نۆترڤان. ــ ی: پاسەوان.

**نۆچە:** لار، گەنج.

**نۆخان** (فە.): نینۆک.

**نۆد** (باک.): نەوەد.

**نۆرە:** نۆبە، چەل، کەرەت. (باک.) درەب، سەرەدۆر، سرە، سییرە، نۆگە.

**نۆرینگ:** مۆڵگەی ماڵاتانی کێوییە. مییل. بۆسەی شەڕو ڕاوییە.

**نۆڕین:** تەماشا کردن، نوواڕیـن، نـێڕتن، (بـاک.) بانـاندن. تێڕامـان، نەێڕتن، نیرین، نەیرین، نیرین، نهییڕین. بنۆڕە: تەماشاکە، دێنکە.

**نۆزدە:** ١٩.

**نۆزگە** (موک.، کە.، ڕۆژ.): نۆبەرە (تەنها بۆ منداڵە).

**نۆزدار** (باد.): دەردی بێ دەرمان.

**نۆش:** ــ کردن: خواردنەوە. ــ بوون: ــ ی گیان بوون. نەنۆشێ (باک.): نۆشی گیانت بێ، (ڕەوا.) وێتداچێ، لەوەڵامدا دەڵێن: لـە خـری دەر نەچێ، بە گیانت خۆش بێ. ــ یی گییان بوون. ــ ی گیان لێ کردن.

**نۆشادر:** کانێکە.

**نۆشادراو** (زا.): نۆشاتراو.

**نۆشان:** خواردنەوە.

**نۆشزا:** نێوی کوڕی نەوشیروانی بوو.

**نۆشیین:** خواردنەوە.

**نۆقا** (باک.): قووم، نقووم. ــ بوون: نقووم بوون. ــ کردن: نقووم کردن.

**نۆک** (فە.): نخە. (هەورا.) نـووەی. (زەن.، ڕۆژ.) نووخە. بە برژاوی بۆ زگچوونی باشەو ڕایدەگرێ.

**نۆکە** (باک.): ئێستا.

**نۆکەر:** بەردەست، ژێردەست. (باد.) بسپۆر. بەندە، بەنی، پێشکار، کەدی. ــ ی منداڵ: کوورک. ــ ی: پێشکاریی نۆکەران. ــ ایەتی.

**نۆکەفەرییکە:** فەرییکەنۆک.

**نۆکەڵ** (ڕۆژ.، کە.): ئەو گاجووتەیە کە تەمەنی دوو ساڵانە بێ و هێشتا جووتی نەبوو بێ. نووژن. بەوکەل.

**نۆکەند:** نۆکەن، تازە هەڵکەنراو، جۆگەی دەستکرد.

**نۆگە** (هەورا.): نۆرە، نۆبە.

**نۆگن** (باک.): نینگوین.

**نۆگۆشە:** ئەندازیاری.

**نۆلی، نۆل** (ئێرە.): وەکوو، وەک.

**نۆوەند** (کە.): گای تازەجووت: نۆوژن، نۆبەند.

**نۆهەد:** نەوەد، نەوەت.

**نۆلا** (کە.): میینا، وەکوو، وەکی.

**نۆما** (فە.، زەن.، جا.، کرما.، هەو.، کە.): جوانووی مێ، جوانووی وولاخی.

**نۆمانگی** (هەورا.): جوورە کاڵەکێکی زەردە زستانان هەڵدەگیرێ.

**نۆوەند** (موک.): دەغڵێکی چاندراوە کە شین بووبێ و هەر چووزەڵە بێ.

**نۆیەک**: لە نۆیان یەکێک.

**نوویکەنیا** (کە.): گاسن تیژکردنەوە.

**نۆیەم**: نۆیەمین.

**نۆیەمین**: نۆیەم، نۆهەم.

**نوییکەنوییک** (کە.): نووکەنووک، گریان، پرمەی گریان.

**نوێزانن** (ڕۆژ.): نووزاندن.

**نوێزە** (ڕۆژ.): نووزە، دەنگی باریک و نزم وکز.

**نوێزەنوێز** (ڕۆژ.): نووزەنووز.

**نۆیین** (هەورا.): نێنگوین.

**نوو** (هەو.): تازە، نووێ. (باک.) نووچە.

**نووا** (کە.، ڕۆژ.): پێشوو، بەردەم، پێش، نەوا، پەنا، (دزە.) نووان.

**نووارین**: تەماشاکردن.

**نووال**: بڕوانە: نەوال.

**نوواڵە** (موک.): سەوڵە، ئەو تەنگووتکە هەوییرانەیە کە لە زاری ووشتر و ئیدی دەنرێ. (دزە.) زەرییێکە بڵندایی و نەوییێتی هەبێ، زوورگ.

**نووان** (هەورا.): نەوا، پەنا، نووا. چوار دیوارێکە، کە لە چۆڵی بۆ ماڵاتان لە پووش و پەلاش یا بەرد یا تانۆک دروست دەکرێ.

**نوواندن**: ڕانواندن، نمانایی، نیشاندان، چارهەڵتەکاندن، چاوبڕکێ کردن، وەرخستن، خەڤاندن، ڕازاندن، خواندن، نڤاندن.

**نوواندنگا**: نمینەگەه. نمایشگا.

**نوانگە**: بڕوانە: نوواندنگا.

**نووایی** (ڕۆژ.، کە.): پێش.

**نووەی** (هەورا.): نۆک.

**نووتەک**: زۆر تارییک، تارییک و نووتەک.

**نووتک** (باک.): گەرای.

**نووچ**: چەم، چەمانەوە. ساتمە، تل.

**نووچاندن** (بابا.): (موک.) فیچانەوە، داهاتنەوە.

**نووچە** (باک.): تازە، نوێ.

**نووچک** (سل.): هەڵە، دووچاری ــ هاتن: هەڵەکردن.

**نووخان** (هەورا.، دەر.): نسینۆک.

**نووخە** (ڕۆژ.): نۆک.

**نووختە**: تنۆک، تک، کپل، نتک: نچک، دەرقەل. ــ دانان: کێلەک خستن.

**نووختەنووختە**: خاڵ خاڵ.

**نووخشە**: نەخشە، بەری هەوەڵی دەغلان، سەرەتای مییوەو دەغلان. (سل.) نۆبەرە، سەرخەرمان. ــ ی دەغڵی: کاتی پێگەیشتنی دەغڵ.

**نووخووری** (باک.): نۆبەرە (بۆ منداڵ).

**نوورە** (زەن.): ڕەژووی بەرد، خەڵووزی بەرد.

**نووردە**: نردوو.

**نووردوو** (باک.): نووردە، (هەو.) نووردیی.

**نووردیی** (هەورا.): نەردوە، (ڕەوا.) چتەک قەدقەد بکەوێتە سەر یەکتری. (ڕەوا.) پاپۆکەی ماری.

**نووڕۆژ** (باک.): نەورۆز.

**نووری** (قەرە.): نۆبەرەی منداڵ.

**نووزا** (باک.): نەوزاد.

**نووزانەوە**: کرووزانەوە.

**نووزاندن**: کرووزاندن.

**نووزە**: گاسکە کرووزە، مزە، گاسکەگاسک، گۆرانییێکە بە دەنگێکی نزم بەسەر لێوانەوە بگوترێ.

**نووزەنووز**: مزەمز، نزە، لەکاتی پەرێشانی و نەخۆشی، نویزەنویز. ــ کردن: نویزانن.

**نووزین** (باک.): تازە زین کراو.

**نووژەن** (هەورا.، باد.): سەرلەنوێ، دووبارە، لەنووێوە، کارێکی تازە، نووڤەژەن، تازە دروست کراو، بە تازەیی. ــ ی: تازەیی.

**نوژداریی** (باک.): دەرمانی شیفایە.

**نووس**: پاشگری پێکهێنانی ناوی کارا، ڕۆژنامەنووس، نامەنووس.

**نووسان**: پێدا ــ : توند گرتن، دانووسان، گەزتن. ــ ی چاو: چاو نووقان. ڕسیان، چەسپان، پێوە نووسان، بۆ پێکەوە نووسانی هەموو چتێکییە، بەلاوە ــ : بەلاوە گیربوون، نەخۆشییەکە پێوە نووساوە: تووشی ئازارێکی بووە. دەنگ ــ : کەرخ بوونی دەنگ.

**نووساندن**: قەمتاندن. چەسپاندن، چتێک بەهۆی چریش یا ئیدیکەوە بە چتێکی ترەوە بنووسێنرێ، پێوە نووساندن: ڕساندن.

**نووساو**: پێوە نووساو، کەرخ: دەنگی کەرخ.

**نووسەر**: نووسیار، نڤیسەر، نڤیسەڤان. ــ ی: نووسیاری.

**نووسەکە**: (دەر.) نووسنەک. گیایەکە بڵند دەبێ و درووی ووردی زۆرە، دانەکەی چکۆڵەیە بە درووی وورد داپۆشراوە، کە ووشک بوو بە جلک و پێڵاوی مرۆیەوە دەنووسێ.

**نووسنەک** (موک.): (؟).

**نووسەکەو**: چڵە گیایەکە نیو بەژن بڵندترو بە بڵاوی چەند کەلێکی دەردەکات پەلکی ووردو باریکەو ... وە تەرە تیبزەی دەچێ سەری هەموو لکەکانی گوڵێکی وورد دێنێ بە تەری دیمەنێکی جوانی هەیە کە ووشک بوو نووسەنەکەی دێنێ کە دانەی چکۆڵەیەو بە درووی وورد داپۆشراوەو بە جلک و پێڵاوی مرۆیەوە دەنووسێ. نووسنووسەک.

**نووسەکە گۆلکانی**: لە نووسەکەی دی چکۆڵەترە.

**نووسەنەک** (موک.): نووسەکە.

**نووسەوەری**: ڕێنووس.

**نووستن**: نڤستن، چاو چوونەخەو، وەرکەوتن، هویتن، ڕازان، چاوگەرم کردن، بووسان، (هەورا.) ووتەی، ڕاکەتن. بنوو: (هەورا.) ووسە، (ڕۆژ.) بویس. ــ ی زستانێ. ــ گا.

**نووستوو:** نستوو، خەوتوو، وەرکەوتوو.

**نووسران:** دێتە نڤیسین.

**نووسراو:** نامە یا کتێبێک نووسرابێتەوە، نامە. ـــ خانە، ـــ خانەی کشتی، ـــ خانەی تایبەتی.

**نووسکاندن:** قرووسکەکردن، کەسێک ئازاری پێگەیشت دادەنووسکێ.

**نووسکە:** قرووسکە، نازکە، ناسکە. دەنگی سەگییە لەکاتی ئازار پێ گەیشتندا.

**نووسکەنووسک:** نازکەنازک، ناسکەناسک.

**نووسین:** ئەو کەسە یا ئەو چتەیە کە چتێکە بە چتێکییەوە بنووسێنێ، پێوەنووسین، چەسپین، چسپین، نڤیساندن.

**نووسییار:** بنووس، نووسەر، نقسیکار، نووسێن، نوویسەر. ـــ ی: نووسەری.

**نووسنەک** (دەر.): نووسەکە.

**نووسین** (فە.): نووسانن، نوویسین، نڤیسین، نوویسان، بە ـــ: نقسکی.

**نووسینەوە:** نووسین یا سەر لە نوێ و دووبارە نووسیینی شتێک، لەبەر ـــ: نووسینەوەی شتێک لەبەر نووسینێکی دیکە، لەسەر ـــ: نووسیینی شتێک لە بارەی شتێکەوە یان بابەتێکەوە.

**نووسینخانە:** دەزگایەکی نووسین، شوێنێکە کاری نووسینی تێدا دەکرێ.

**نووسینگە:** جێگای نووسین، شوێنی تایبەتی پارێزەرێک، یان پزیشکێک یان ئیتر.

**نووشتان:** تەربوون، چەمان.

**نووشتانەوە:** دانووشتان، سیپوان، پێوەدران.

**نووشتاندن:** دانووشتاندن، پێوەدان.

**نووشتاندنەوە:** دانووشتان، (هەو.) بن خێوکردن، بۆکەناری لێفەو چتی وا دەبێ.

**نووشتاوەوە:** دانووشتاوەوە.

**نووشتە:** نشتوو.

**نووشتەوار** (موک.): کۆتەڵ، (هەورا.) هەڵنووچاندن. (دزە.) بادانەوە. (موک.) داگرتنەوە. کەناری پارچەیەکی بنووشتێتەوە.

**نووشتوو:** نووشتاوەوە. (باک.) نووشتی، نووشتە، نشتوو، حەتۆتە، حەمایەل.

**نووشتی** (باک.): نووشتوو.

**نووشدار** (باد.): پزشک.

**نووغرۆ** (دزە.): ـــ بوون: نقوم بوون، رووچوون.

**نووغوورد:** جێگایەکە پڕ لە گیاو تێکەڵاوی.

**نووفەژەن** (باک.): نووژەن.

**نووقان** (کە.): جووقان، بەستی.

**نووقاندن** (کە.): جووقاندن.

**نووقاو** (کە.): جووقاو، قووچێنراو.

**نوقره** (فە.): زێو.

**نووقڵ:** شەکرۆکەو شیرینییات.

**نووقڵانە** (هەورا.، بابا.): نەخشەی چاک و خراپ، ـــ پێدان: نەخشە لێدان. ـــ ی چاک: نەخشەی چاک. ـــ خراپ: نەخشەی خراپ، هەڵکالان.

**نووقم** (کە.): قووم، نقووم. ـــ بوون. ـــ کردن.

**نووک** (فە.): دندووک، نووکی پێنووس، نکل، نوییک، (کە.) دەمکە قەڵەم، سەر، (باک.) ریش، بە پەڕی باریک و تیژی هەموو چتێکی دەڵێن، وەکو ـــ ی خەنجەر و نێزە. نوختە، ـــ ی قامک، (باک.) بار. ـــ گە: خاڵ، پنت. ـــ ی قامکان: سەری پەنجان.

**نووکاندن:** نووزاندن.

**نووکە:** کوورکە، ـــ ی منداڵ: لە گریانیدا، ـــ کردن: نووکاندن. ئێستا، وێستا، هەنووکە.

**نووکەند:** نۆکەند، نۆکەن. جۆگەی دەستکرد.

**نووکەنووک:** نێوی دەنگێکە لەکاتی گریانیدا کە پشوو دەخواتەوە، ـــ ی لێ دێ، کوورکەکوورک. نوییکەنوییک.

**نووکەنیا** (کە.): گاسنی کۆڵ تیژکردنەوە.

**نووکتیژ:** شتێک کە نووکی تیژبێ.

**نووکراندن** (باک.): چاولێک نان، چاوقووچاندن.

**نووکن:** بە نووکەنووک، سەرتیژ.

**نووکی کونکار:** نووکی مرازێکی کونکەرەوە.

**نووگە:** نۆبە.

**نوسند** (موک.): دەغڵێکە بەهاران دەچێنرێ، دەغڵێکە پاییزان درەنگ بچێنرێ و تا بەهاری ووشک نەبێ، لاپستە.

**نوونگ:** نیبشانە، شوێن.

**نووسکە:** بروانە: سووسە.

**نوو ووَن** (کە.، رۆژ.): گا جووتێکە تەمەنی دووساڵ بێ و هێشتا جووتی نەبووبێ، نۆوەند. بەرکەڵ.

**نووها** (باک.، فە.): ئێستا، سەرەتا، پێشی، ل نوها: لە سەرەتادا، لە پێشەوە.

**نەوهاڵ** (بۆت.، زێ.): نەواڵ.

**نووهە:** ئێستا.

**نووهەوار:** نووێ هەوار.

**نوهۆم:** چینە ژوورو خانەیەکی ساختمانێکی فرەچینی لەسەر یەکتر.

**نوهۆک:** ئاوەلفرمانی کاتی.

**نوهۆن** (کە.): گوێلکە نێری دووساڵانەیە.

**نووهووت** (کە.): گوێرەکەی دووساڵانەی مێیە. نێنگوین.

**نووێ:** (هەو.) تازە، نوو، نەو. سەر لە ـــ: لە ـــ وە: دووبارە، دییسان.

**نووێ بووک:** کوولۆلۆ.

**نوویچدان** (رۆژ.، کە.): چەمانەوە لەبەر بێهێزی.

**نووێرده** (هەورا.): تیپێک، دروومانێکە، دووای قەدێک، دروون لە دیوی ژوورەوە هەردووک سەری پارچەکان لوول بدرێ و بدروێت.

**نویرسە** (کە.): دروومانە لەپاش نوشتاندنەوە.

**نویزە** (کە.): نووزە.

**نوێژ** (هەورا.): نما، نماز، ـــ کەر: کەسێک کە نوێژ بکا. بە ـــ: کەسێک دەستنوێژی هەبێ، یان شتێک خاوێن بێ و بشێ لەکاتی نوێژکردندا بەکار بهێنرێ. بێ ـــ: شتێک کە لەکاتی نوێژ کردندا نەشێ بەکار بێت، یان کەسێک کە دەستنوێژی نەبێ.

**نوێژە بارانە**: نوێژێکە دەکرێ و داوای باران بارین لە خودا دەکرێ.

**نوێژگا**: شوێنی نوێژ کردن.

**نوێژگە**: بڕوانە: نوێژگا.

**نووێژی** (ڕۆژ.): نییسک.

**نوویکار**: تازەکار، کەسێک، کە تازە دەستی بەکارێک کردبێ.

**نوویکیلشە**: تازەکییسە، تازە دەوڵەمەند بوو.

**نوویگووان**: نێنگووین.

**نووێڵ** (هەورا.، شارە.): ئاسنێکی درێژ و قورسە بەردی پێ هەڵدەقەنرێت. باری، ڕنگلیزە.

**نووێ ماڵ**: نوماڵ.

**نووێن**: پێخەف، شەوییش، نقیین.

**نووێنەر**: نمیینەندە، دەسنێژ، (باک.) بندار، ناردراو، نماینده، نمیینەکار، بندار. کردنەوە ـــ: بەنێردراو کردن. بوونە ـــ: بەنێردراو بوون. ـــ ی: بنداری. جێگر، بریکار، نێرراو.

**نوویسان** (کە.): نووسیین.

**نووێ هەیف**: مانگی نوێ.

**نوویسەر**: نووسەر.

**نوویسین** (کە.): نووسین.

**نوویشک** (بار.): ڕۆنی کەرە، سەرڕشتە.

**نوویک**: تووک.

**نها** (باک.): ئێستا، ژ ـــ پێڤە: لەپاشان.

**نهال** (باد.): نەمام.

**نهاندن** (باک.): بنهیینە، دانان. تێ ـــ: تێنان.

**نهانی**: ڕاز.

**نهە** (باک.): ئێستا.

**نهک** (باک.): قولاپی ماسی گرتن. قولاپی گۆرەوی چنین.

**نهگوون** (باک.): نینگوین.

**نهۆ** (باک.): ئێستا.

**نهۆم**: (باک.) تا. حۆلی، سەرەلی، ـــ می هەرسەرەوە. ـــ ی خووارەوە: بنەلی: ـــ ژێرەوە.

**نهۆن** (کە.): پارگوویری نێرە. گوێرەکەی نێریی دووساڵانە.

**نهوو** (باد.): ئێستا.

**نهووم** (موک.): تێشکان، لاواز، بێتین.

**نهێرتن** (باک.): بنهێرە، نۆڕیین، (باک.) نێڕیین.

**نهێریین**: نواڕین، نۆڕیین، سەیرکردن.

**نهێن**: شۆڤار.

**نهێنی بیین**: کەسێکە نهێنی ببینێ.

**نهێن بڕ** (کە.): ئاوان، بێبەخت، نهێنگیر، ناپاک، پەترەش، سەگی یاڵی گر.

**نهێنیگیر**: ناپاک، خاین، سەگی نهێن گر.

**نهێن گیر**: یانی گر، بێبەخت، نهێن بڕ، ئاوان، پەترەش.

**نهێنی** (بابا.): نهانی، ڕاز، پەنهانی، بەژێر لێوانەوە.

**نهێنیار**: ڕازگر، سکرتێر.

**نێ نیازی**: دەوڵەمەندی، بێ نیازی.

**نهیبو**: ترس، تۆقیین.

**نهیرپین** (باک.): نوواڕیین، تەماشا کردن.

**نیا** (هەورا.): نییە. (ڕۆژ.) تەماشاکە. ـــ کردن: تەماشاکردن.

**نیاز**: ئارەزوو، پێویست. ـــ لە خوڵا خواستن.

**نیازان**: نەزان، گێل.

**نیانگر**: یانی گر.

**نیاوە** (شو.): پێشەوە، لای پێشەوە.

**نیای** (هەورا.): چەقاندن.

**نیایرە** (هەورا.): دانان، دانین.

**نیە**: توونە: توونە. نیۆ، نینە.

**نێچیر**: گۆر، نچیر. ـــ ی جانەوەرو دەعبایان. ـــ گرتن.

**نێ ئاساو** (هەورا.): زەمبوورەکی ئاشی.

**نێچیرەوان**: (باک.) نێچیرڤان، نەچیرەوان، ڕاوکەر.

**نێچیرڤان** (باک.): نێچیرەوان.

**نیخەنیخ**: چرتەچرت، کێشەکێش.

**نێر**: واژیی مێیە. نێرە، کەڵ. ـــ بوونەوە: کژ، دووای بارانە زەویی کە پندربێتەوە. دەڵێن نێر بۆتەوە: ـــ دەبێتەوە: دەچەقیتەوە.

**نێرراو**: نوێنەر، نماینده.

**نێرو** (باک.): شۆڤار.

**نێرە**: نێر، دووبە. کووپەی زەلامی داری. مەشکەیە لە بەرمیل یا لە دار و تەنەکە دروست دەکرێ.

**نێرەر**: کەسێکە، کە هەر شتێک بنێرێ.

**نێرەژەن** (هەورا.): ئاودۆک، نێوداری مەشکەی.

**نێرەبەن** (موک.): گیایەکی قایمە وەکو فریزوویە و درێژە باقەی پێ دەبەسترێ. گیایەکە شیرەکەی زەردە دووایە ڕەش هەڵدەگەڕێ.

**نێرەک** (هەورا.): نێرتک. ـــ ی ترەو: نێرتکەتوور.

**نێرەکەر**: گۆڵەکەر.

**نێرەکەو**: کەری نێر.

**نێرەکێ**: ئێستری نێرە.

**نێرەمۆ** (باک.): نێرەمووک. ـــ کردن: پەیوەند کردن.

**نێرەمووک**: (باک.) نێرەمۆ، چەچە، (هەورا.) نەمێرد، بێ بەر. ڕەنگ مەییک.

**نێرەنان:** تیرۆک.

**نێرەومێیە:** نەرمادە، نێرەومادە.

**نێرەهەر** (هەورا.): نێرەکەر.

**نێرەهەنگ:** هەنگی نێر.

**نێربلز:** هەتیوباز. ــ ی: هەتیوبازی.

**نێرتک:** نێرک، نێرەک. ــ ی پیسوازی: کرۆک، کووروو، کوورەک.

**نیرتک** (خۆ.): قاتۆرک. ــ ی گیاو بریینان.

**نێرتکەپیواز** (هەو.): تەرە لەیلان. (سوور.) باقۆتە.

**نێرتکەرێواس:** جـووره ڕێواسـێکه لـەنێو دوو گـەڵای پـاندا دەڕووێ و هەڵدەچێ.

**نیرتکەشوانە:** پەلەشوانە، گیایەکە دەخورێ و بۆنی هەیە.

**نێرتن** (باک.): بنێرە، نوریین، تەماشاکردن.

**نێردیوان:** نەردیوان، (دزە.) پێ بلقـە، (پژ.) سەردووک، (بابا.) پـەیژە، پێ پییلکە.

**نێران:** ناردران.

**نێررو** (زا.): ناردراو، شاندە.

**نێررومیەک:** نوێنەرێک، شاندەک.

**نێرک:** نێرتک (ئی پیبواز و نیـتر)، (کـە.) کرۆک، (ڕۆژ.) نێوەڕاست، نیرۆک. نێوەرووکە.

**نێرگە** (بابا.): کاریتە.

**نێرگەلە:** قەنەی ناوی، قلیاناوێ، قەلیاناوی.

**نێرگس:** زەرییم، نـەرگس، گیایەکـە تـا سێ بست بڵندە، گەڵای درێژ و باریکە، بۆنی زۆر خۆشە و نێـوی گوڵەکـەی وورد و سـپییە بۆنەکـەی بـە تازەیی بۆ کرمی دەماخ زۆر باشە. گوڵێکی کێویی و ڕەنگ سپی و مـەیلـەو زەردێکی زۆر کەمڕەنگە، کەمێکیش بۆنی خۆشە. بۆنەکـەی بـۆ هەڵامـەت باشە وەکو فنجان وایە. نێویی ئافرەتانیشە، (باد.) بنەکەی بکرێتـە چرک بۆ بریناان، دووجووره: ــ ژۆری: سەری گوڵان زۆر دەداو گەورەن. ــ کتک: سەری گوڵان کەم دەداو گچکەن. (باک.) جووره تفەنگێکە.

**نێرگسی جۆریی:** شێست پەڕ، گوڵێکە.

**نێروو:** نێری، کەڵەکێوی، حەیوانە کێویی نێر.

**نێرم** (لو.): نییمە.

**نێرنێرمی** (باک.): چاوەڕێ. ــ کرن: چاوەڕێ کردن.

**نێروەیی:** هۆزێکە لە جافان.

**نێرۆک** (ڕۆژ.): نێرک، نێوەڕاست، نیرکک.

**نێرومێ کردن:** لێکدانی نێر و مێ.

**نێرووبەند** (باک.): گیایەکە.

**نێریتی:** نێرایەتی، نێربوون.

**نێریەکێویی:** هەڤۆ، ناڤۆر، ئەڤۆر، کەڵ، هەڤووری.

**نـێریی:** نـێرەی بزنانـە، کـە گـەیشتە سێ ساڵی کـە خەسـابێ خـەرتی پـێ دەڵێن. گیسکە نێریکە چوار بـەهاران ببینـێ. (هەورا.) سابرێن، تەگـە، ئەلۆریی، ساورین، هەوری.

**نێرپین** (باک.): نۆرپین، تەماشاکردن.

**نێریینە:** منداڵی نێرە.

**نێز** (باک.): قاتی، گرانی.

**نێزە:** نیزک، ڤزک.

**نێزبۆهێر** (سور.): ڕابووردووی نزییک.

**نێزک:** (کە.) نێزیک.

**نێزیک:** دوورنییە.

**نێزییکا** (باک.): بەلای کەمەوە، بەلای نزییکەوە.

**نێزییکە:** هاکا.

**نیزیکتر:** نزیکتر، لەپێشتر، خزمتر، دۆستتر.

**نێزییکی:** نێزییکا، (باک.) پررۆ هندک، هەماهەما.

**نێژان** (کە.): ناژران.

**نێژاندن** (کە.): ناژتن.

**نێژتن:** ناژتن.

**نێسایی** (باڵ.): ئاسانی.

**نیسی** (جا.): بەلاَن کە بڵێن نییە هەر نیەی بەکاردەبەن.

**نێش** (هەورا.): ئێش.

**نێشانی** (باک.): دیارییەکە لەنیشانە کردنی کچاندا پێشکەش دەکرێ.

**نیفـەک** (هـەورا.، ڕەوا.): ناوپیسـتێر، (دەر.) ناوفـەک، (هـەورا.) نەفەک، پییستێر، (ئامێ.) پییسێر.

**نیف** (باک.): ناڤ.

**نیفچی** (باک.): تەرخان.

**نێفک** (باک.): نێوک. ــ ا من کەتییە.

**نیفکۆ** (باک.): دالان، پێشخانە.

**نیـک** (هـەورا.، دزە.، ڕۆژ.، کـە.): ئەسکێ. (بان) ئەسکنج، ئێسـکی سەرەوەی قوونییە، ئێسکی سەرەوەی سمتییە، نیزیکی کەلەکەی.

**نێڤمال** (باک.): نێومال، زەویی ژێر ژوور.

**نێڤران** (باک.): نێوڕان.

**نیفرۆ** (باک.): دوورگە.

**نێڤسەرک** (باک.): کلاوی زیویین کە ژنان لـەسەری دەنێن. تاس.

**نێک** (هەورا.): (موک.) کۆڵمک. (باک.) نێهک.

**نێگووان** (باد.): نێگوویین.

**نێل** (باڵـە.): نزار، پارچە شینایێکە بە بەرقەدی شاخانەوە، کـە ئاوییشـی هەبێ و خۆرسک بێ.

**نێلە** (هەورا.، سەق.، کە.، موک.): نیریی جووتی. گریە.

**نێلەمل** (هەورا.): کاریتە.

**نێلەنێل** (جا.): ــ یی ئاوریی، گرفەگرف، گڕەگرپ، هیلـەهیل، (هەو.) گڕەگرپ.

**نێم** (باک.): هەواو کێمی بریینان.

**نێو لێ نان:** ناو لـێ نان، ناو بۆ دانان.

**نێو لێ نراو:** ئەو کەسەی ناوی لێ نراوە، باسکراو.

**نینگوین:** نینگوینگە، (دەر.) نوخان، (جا.) نیون، نووهووشت، (شەم.) مێکان، نهگون، (بار.) مێگوان، کوێلکە مێیەکی سێ سالانەیە، مێنگوین، نۆگن، نەهگون، نۆون. نووێ گووان.

**نینگوینگە:** نینگوین.

**نێو:** بێ ــ : نەناسراو. لە ــ نان: تێ بردن، تێ برین، تێراکردن، تێرۆکردن، دەناونان، تێنان. ــ بردن: ناونان، ناوهێنان، خووررین، ناڤ بردن، ناو، ناڤ. بە ــ : وەنام، نێودار، بەناو، دیار. ــ لێ هێنان: نیشانەکردن، دەستنیشانکردن، (باک.) تات، تەعت کردن. ــ لێنان: ناڤ لێدان، ناڤاندن. دەنێو: لەدەرۆ. لەنێو: تۆولۆ، تووێ. (باک.) د، دێ، ژورو، هووندور. لە ــ چوون: فەوتان، مردن، کوژران، تۆڤ دان. ــ پەیدا کردن: ناوبانگ دەرکردن. لە ــ موە چوون، پییزبوون. لە ــ یدا: لەناویدا، بەد ــ : بەدناو، بەدنام. (هەورا. کۆن.) نییە. دەر ــ : لەنێو، تۆولۆ، تووێ.

**نێوان:** ماودا، ماوە، مەودا، ناڤبەر، ناڤبێن، دۆستایەتی، ئاموشۆ. ــ بوون: پەیوەندی.

**نێو ئاخن:** ناواخن.

**نێوەڕاست:** هاوێر، ناوەند، ناوەڕاست، جەرگە، نێرک، نێرتک، کرۆک.

**نێوەرووکە:** نوختەی هەرە نیوەڕاستی، نێرتک، نێرک.

**نێوەک** (بار.): قامکی درێژ و گەورەیە لە تەنیشت قامکی شادەیە. هەڵمەقووتە، ئەرنەمووتە.

**نێوەکی:** نێوان.

**نێوەندیار:** نێوبین. ــ ی: نێوبینی.

**نێوەوە:** هووندور.

**نێوبانگ:** ناوبانگ، نێودار، ڕەمۆ، سەرەودەر، ناوە دەنگ. ــ دار: بەنێ، بەناو، بەنێوبانگ، بەناوبانگ، دیار، بناڤ. ــ ی: بەناوبانگ بوون. ڕوومەت، خوەدی.

**نێوبراو:** ناوبراو، ناوگۆتراو، باسکراو، گۆرین.

**نێوبژی** (هەو.): پێناوی. ــ کردن: ڕابەری کردن، نێونجیتی کردن. ــ کار: کۆستەک. ناڤبین چی. ــ ی: کۆستەکی، ناڤچێتی، (هەورا.) چار.

**نێوبژێتی:** بەرەوانی، بەرەڤانی، ناوبژی.

**نێوچاوان:** چارە: نێوچاوان ڕەش، چارەڕەش. تەولە، (بابا.، دەر.) ناوچەوان، ناوچاوان، فەرشەنی. تێوڵ، (هەورا.) تەویڵ، تووێڵ، نەخشی، توێڵ. (باد.، کە.، باک.) نەنی پێشەنی، (باد.) نانی، (جا.) پێشانی، (مەند.) پێشانگی، (هەورا.، ڕۆژ.، مەنگ.) تووێڵ، (ڕەوا.) هەنی.

**نێوچاوان سپی:** قەشقە، (جا.) قەشان، بۆ وڵاخی بەرزەیە.

**نێوچاوان تێک نان:** گرژو مۆن بوون.

**نێوچاوە:** ــ ی ئاوری: ناوەندی، جەرگەی.

**نێوران:** نیڤران، ناڤران.

**نێوزگ:** ناوزگ، ناوسک، هەرچی لەناو زگدایە.

**نێودار:** ڕەمۆ، بەنێو. ــ بوون: ناو پەیداکردن. (هەو.، موک.) مرازێکە لە نی تەونی. بەنێو، بەنێوبانگ، ناودار، (موک.) ــ ی: مەشکە، دیار، ناودزگ، ناومێری، نێرەژەن، خوەیناڤ، ناوبانگ. دەنگدار، دەنگانە، ناودار، ناڤدەنگ، بەنێو، ناڤدار. ــ یی مەشکە: دار دۆژەنگ، نیرەژەن. ــ ی (باک.): ناڤدەنگی: ناڤداری.

**نێودەرگە:** ناڤدەر، دالان.

**نێودەشت:** ناڤدەشت، دەشتێکی چکۆلەیە.

**نێودێر:** (تەمەن درێژ) لەکاتی ناونانی منداڵدا بەناوی پیرۆزبایی بە دایک و باوکی دەکوترێ: نێودێر بێ.

**نێوساجی:** ناوساجی: لەلەنگی، ناسییلک، کادە. ــ فرۆش: کادە فرۆش.

**نێوشان:** ناوشان، ناوملی، سەرەوەی پشتی.

**نێوک:** ناوک، ناڤک، نێڤک، نیڤک. (هەورا.) نەهە، ــ ی شووتی: ناڤکاشفتی، ناوکەرزێ.

**نێوکەوڵ:** هەڤتینک، (دەر.) هەفتینی، پییت، (هەورا.) پییتە.

**نێوقەد:** ناوقەد، تەنکێش، تەنگە.

**نێوقەدبەند:** تەنکێش، (هەورا.) بیبێن.

**نێوکەرەشە** (موک.): برینێکە لەسەر گری پشتی وڵاخان دێت. لەبەر بارو ژینی.

**نێوکەوڵ:** پەیینکە.

**نێوگەڵ:** ناوگەڵ، گەڵ وگوون. سوورێنچک.

**نێومال:** ناوماڵ، (هەو.) دەروودۆر، پرپۆل، (باک.) تەکبەر. پرپۆل، (ڕۆژ.) نێڤماڵ، دێ، (هەورا.) یانە، بارخانی، کەل وپەلی نێوماڵی.

**نێون** (جا.): نینگوین.

**نێونجی:** نە گەورە نە چکۆلە، ناڤهنجی، ناونجی، بەرەدایی.

**نێونەترک:** ناتورە، نەتورە، ناوونرتک، نەنک، بەندوباو.

**نێوونیشان:** پێ شوێن، ناوونیشان.

**نێونێوە:** ناوناوە، جارجارە.

**نێونیرە** (موک.): (موک.) بەرروولە، (ڕۆژ.) کرمە، (موک.) شییلەمە، (هەو.) بەروانکە، دارخەزنە. شوێن ناوێژە، پارچە دارێکە لەنێو کونی شییلەپی دەنێن تا نەجوولێ و نەیەتەدەرێ.

**نێوی لاوە:** نێوی خواستراوەوە.

**نێهک** (باک.): نێک.

**نیا** (کە.، ڕۆژ.): تەماشا. ــ کردن: تەماشاکردن.

**نیاتە:** پاشەکەوت. ــ کار: پاشەکەوتکار.

**نیاز:** ئارەزوو، ویستی دڵ، دڵخواز، مەیل.

**نیازان** (باک.): نەزان، گەوج. (باک.) ــ یی: نەزانی.

**نیازکار** (باک.): چاپلووس. (باک.) ــ ی: چاپلووسی.

**نیازی:** نێوی پیاوییە.

**نیان** (کە.): نیهان.

**نیانەوە:** هەڵخستنی تەون و شێلم و ئیتر.

**نیپانی** (کە.): پەنهانی.

**نیبە:** توونە، توونە، (هەورا.، کۆ.): نێو.

**نیبتک:** پەلە، (ڕۆژ.) پل، لککە.

**نیخاندن** (کە.، ڕۆژ.): سستی و نکاندن لەکاردا.

**نیخەنیخ:** سیخسیخ.

**نیر:** نیڵە، (ڕۆژ.) جەلە. ڕشمە، ڕیپشی، ڕیپش، لە کەرستەی جووتی ئەو مرازەیە کە لەسەر ملی گاو و ئێسترو کەران دادەنرێ. نییل.

**نیڕراندن** (ڕۆژ.): هەراو هاوار کردنی بێ سوود، بێ شەرمانە نەڕاندن.

**نیڕڕە** (ڕۆژ.): نەڕڕە، هەرای بێ سوودو بێ شەرمانە.

**نیڕەنیڕ** (ڕۆژ.): نەڕڕەنەڕ، هەراهەرای بێ سوودو بێ شەرمانە.

**نیرەوان:** هێز، تین، زەبر.

**نیرتە** (بل.): هیرتە، وێژە، قایشێکە، کە نیرو باسکیش لێک قایم دەکات.

**نیرگە** (خۆ.، (بابا.): کاریتە.

**نیشە** (هەورا.): دانیشە.

**نیشتەبرە** (هەورا.): دانیشتن. نیشەوە: دانیشە. مەنیشەوە: دامەنیشە.

**نیرۆ** (زا.): نێوەڕۆ.

**نیرونامورر:** ئاقێلە، ئاقێلەوماقێلە، (بل.) ئێش.

**نیزییک** (ڕۆژ.): (ڕۆژ.) نێزگ.

**نیسک:** لات.

**نیسک:** مێژوویی، نژیی، نووێژیی.

**نیسکەشور:** (؟).

**نیسکێنە:** شۆربای نیسک، (هەورا.) مییژوویینە.

**نیسێ:** سێبەر، چۆلک، نسێ، سای، (هەورا.) سەی. ــ کردن: سێبەرکردن، ــ دار: سێبەردار.

**نیشا** (باک.): نیشانە. ــ کردن.

**نیشاستە:** نشاستە.

**نیشان:** سەرنامە، شەقڵ، نیشا. بە ناوو ــ: بناڤ و نیشان. ــ دان: پیشاندان، ڕانان، پێشچاڤی کرن، ڕابەرکرن، دەست لاداشتن. ــ کردن: شانی دان. ــ ی تفەنگی.

**نیشان ئەنگێو:** نیشان شکێن.

**نیشانە:** نیشان. بوونە ــ : بوونە ئامانج. ــ کردن: دەستنیشان کردن. ــ شکاندن: نیشانەپێکان. شتە، باڵەتە، موور، خاڵ، بنک، پەڵە، شەقڵە، شەقڵ، ئامانج، ئارمانج، مەبەس. پنکێکی ڕەشی چکۆڵە یا گەورەیە لەسەر لەش. ــ گرتن: مشتەگرتن، ــ بوون (هەورا.): جزکردن، چراغ کردن، شوێن کردن، نێو لێ هێنان، دەست نیشان کردن، تات، (باک.) تمەت کرن. لە ــ دان: ئەنگاوتن، پێکان. ــ ئەنگاوتن. ــ ی نیفتیخاری (باک.): ڕست. لە نیشانەدان: هەڵەشە.

**نیشانەئەنگێو:** ئامانج پێکەر. ــ ئەنگێو: بە ئامانج گەییو. نیشانەشکێن.

**نیشانەدار:** پنکدار، خاڵدار، پەڵەدار.

**نیشانەشکێن:** نیشان ئەنگێو، سەگڤان، سەگمان.

**نیشانەدار** (باک.): ئەنگێوە.

**نیشاندان:** خۆ ــ : خۆ پیشاندان، خۆدەرخستن، پێش چاڤی کرن. پیشاندان، ونارا، ڕای کرن، نواندن، چاو هەڵتەکاندن.

**نیشانەک** (باک.): نیشان. ــ ا ئاخافتنێ. ــ دوونکان: ناوی نیشانە، ــ هیدانێ: پەشۆکان لەبەر شادی و ئیتر. ــ پینەکان: پارانتیز. ــ ی پرس: ؟.

**نیشاندن:** نیشتاندن. نیشاندنەوە: نیشتاندنەوە.

**نیشانک** (باک.): خاڵ. (.).

**نیشانگا:** جێگەی نیشانە.

**نیشانگە:** نیشانە، شتێک کە بە بەر چاوەوە گیرابێ.

**نیشانی** (باک.): دەزگیران، نیشانەکراو.

**نیشتە:** هەموو شتێکی، کە بنیشێ (بنیشێتەوە) ــ لە کیمیادا.

**نیشتەجێ:** دانیشتوو. ــ یی بوون.

**نیشتەر** (ڕۆژ.): نەشتەر. (فە.) پاشەرۆک (تەنها بۆ منداڵ دەبێ).

**نیشتەی** (هەورا.): نیشتەوە، دانیشە. دانیشتن، چاوەڕێیی، مانەوە. نیشتن (بۆ ئاو)، ماستاو.

**نیشتەیرە** (فە.): دانیشتن.

**نیشتەین** (هەورا.): نیشە، دانیشە، بنیشەرە: دانیشە. دانیشتی. (فە.) نیشتی.

**نیشتگە:** نیشتمان.

**نیشتمان:** زێد، مەڵبەند، مەڵوەند، (باک.) توورت، خاک. هاوی.

**نیشتمان پەرست:** خاک پەرست، وڵات پارێز. ــ ی: وەڵاتێنی: وەڵاتی، وڵات پارێزی.

**نیشتمان پەروەر:** خاک پەروەر. ــ ی: خاک پەروەری.

**نیشتمانی:** هەموو شتێکی سەر بە نیشتیمان. نەتەوایەتی.

**نیشتمەنی:** نیشتەمەنی.

**نیشتن** (فە.): (هەو.) ئەورین، دانیشتن. ــ ی خڵتەی چتان.

**نیشتنەوە:** ــ ی خۆرو مانگ، ئاوابوون.

**نیشتنەسەریەک:** ــ ی هەڵامساو: فشیین.

**نیشتنگا:** جێی دانیشتن. ــ ی نوێنەرانە: جێی دانیشتنی ئماییندان. ــ ی گەورانە: جێگەی گەورەکان.

**نیشتوو:** هەڵنیشتوو. نیشتک.

**نیشک** (باد.): لەپڕا، لەنەکاو.

**نیشۆک** (باک.): بڕنووت، توتنی هەڵمژیین.

**نیگار:** وێنە، ڕووپەر.

**نیگەرانی:** ناڕەحەتی، دڵ پەرێشانی.

**نیفۆ** (سوور.، دزە.): پزووی دەربێ، نافەک.

**نیقانی** (باک.): لەت لەت.

**نیقەشەف:** نیوەشەو.

**نیقەکار** (باک.): نیوەکار.

**نیقەلیر** (باک.): گرژو وینەیە.

**نییڤجۆ** (باک.): ناتەواو، نییڤچە.

**نییڤرۆ** (باک.): نییوەڕۆ.

**نییڤرۆکی** (باک.): دەنیوەڕۆیەدا.

**نییڤهاڵ** (باک.): نییو، لەت. بنییڤی: بەلەتی. ـــ ی شەڤی.

**نییڤکار** (باک.): ڕووکاری سەرەوە.

**نییڤکۆسە** (باک.): نییوەکۆسە.

**نیگار**: وێنە. ـــ گرتن: وێنەگرتن.

**نیگەران**: دوودڵ، پشێو، شێواو، هوولـڵولی، دڵـەس ڕاوکـێ. ـــ ی: دوودڵی.

**نییل** (کە.، ڕۆژ.): هاوشان، ئەو گایە لەگەڵ ئەو گایە نییلە. شەیپووری گەورە.

**نییلوپەر**: لیـیلووپەر، نییلوفەر، لوولووپەڕ.

**نییلوفەر** (باک.): جوورە گوولێکی سپییە، نییلووپەر، لیـیلووپەر.

**نیم** (کە.): نیو، نیڤ.

**نییمان** (هەورا.): میـیوان.

**نییمە** (جە.): لەتکە خشت، ئاجوور.

**نییمەڕۆ** (لک.، دەر.): نییوەڕۆ، نییمەڕۆژ، (فە.) نییمەڕوو.

**نییمەڕۆژ** (فە.): نیوەڕۆ.

**نییمەسۆز** (زەن.): برۆژ، سەلکەبزووت.

**نییمیرش** (فە.): دەڵـمە.

**نییمچە**: نیڤە، ناتەواو.

**نیمچەدوورگە**: خاکێک، کە لە زۆر لاوە بە ئاو دەورەدرابێ.

**نیمچەلادەر**: تربووسدار، غدار، (دزە.) شەدار.

**نییمرویی** (کە.، ڕۆژ.): نییوەغەک، ئاردو هێلکەی گیـیراوەوەیە ڕوونی تێ هەڵدەسوون و لەسەر کولک و قوونێرانی دادەنێن تـا دەریکـات یـا بییرەوێنێتەوە.

**نییمگییر** (زا.): یانی گر.

**نیین** (باک.): نییینە، ئەوان نیین، نییە. ـــ بوون: نەبوو.

**نیینا** (باک.): دەست لێک دان، چەپڵە لێدان.

**نیینە**: نییە، نیین.

**نیینەنیینە**: خانەخانە، کە مریشکان داکەنە کولانەی.

**نیینک** (باد.): نیینۆک.

**نیینۆک** (دەل.): ناخوونێن، هەنیۆک، (شو.، هەورا.) ناخوون، نەینوک، نووخان، نیینک، نخان، ناخۆن.

**نیینۆکە** (خۆ.، ڕەوا.): دەردێکە لـە لووتی وولاخی بـەرزە دەردێ، کـە دەری نەیەنن دەیکوژێ.

**نییۆ** (هەورا.، کۆ.): نییە.

**نییو**: نییڤ، نییم.

**نییوئەشکێل**: نییوەتییرە (ئەندازە).

**نییوە**: نییو، نییمە، نییڤ.

**نییوەئەشکێل**: نییوئەشکێل.

**نییوەبرژاو**: نییم برشت، برشت.

**نییوەبرێژ** (موک.): بۆ دانی گەنم و کونجی و قاوەو ئیدی.

**نییوەتا**: نییوە فەردەیەک.

**نییوەچڵ**: نییوە و ناتەواو.

**نییوەدوورگـە**: دوورگـەی ناتـەواو، زەوییـەک، کـە لـە زۆر لاوە بـەئاو دەورەدرابێ.

**نییوەر**: دووکەرت کەر (ئەندازە).

**نییوەڕۆ**: ناڤرۆژ، نییڤرۆ، (زا.) نییڕۆ، (دەر.، لک.) نییمەڕۆ، (هەو.) نییوڕان. باشوور.

**نییوەڕۆبـار**: پشوو و وچانی نیوەڕۆیانی کاروانچییان. حەسانەوەی نیوەڕۆیان.

**نییوەڕۆژ**: جەمی نییوەڕۆیە، (هەورا.) نییمەڕۆژ، نانی نیوەڕۆیە.

**نییوەشەو**: نییڤەشەڤ، نییوەی شەو، نیمەشەب، نیڤاشەڤێ.

**نییوەکار**: هاوبەشی کار. هاوکار، نییڤەکار.

**نییوەکوڵ** (شن.): خاوەچی.

**نییوەگەر**: شتێک، کە شتێکی دیکە دوو کەرت بکا.

**نییوەگیان**: نیمەگیان. نیوە مردوو.

**نییوەنمەک**: هەوریێکە لەسەر برین دادەنرێ. نییمرۆیی.

**نییوتەرک**: بۆ لە جێ چوونی تەنها لاسمتێکی وولاخی بەکاردەبرێ کە داخزابێ.

**نییوچەدوورگە**: نییمچە دوورگە.

**نییوخرۆک**: نییوەگۆ.

**نییودەشت**: نەکۆنە و نە نوێ.

**نییوڕان** (هەو.): نییوەڕۆ.

**نییوڕۆ**: ژێرۆ، باشوور، خۆراوا.

**نیهاد**: ویژدان، دڵ و دەروون، ناوی پیاوانە.

**نیهاڵ**: نەوهەل.

**نیهانگیر**: یانی گیر.

**نییهانی**: نەهێنی، نهێنی.

# و

و: تیپێکی ئابێی کوردییە.

ۆ (ئـەهـ.، بـاد.، شـکا.): بـە دوای ئـەو ووتانـەوە بنووسـێ بـۆ نـێران بـەکاردەبرێن و بۆ بانگ کردنیشە (عـەزیزۆ، جـانۆ، خـالۆ، کـاکۆ) وای، هەی، ئەی خالۆ، ئەی کاکۆ.

وا (هەورا.، دەر.): ئەوا: ـــ دێت، (ژاوە.، ڕۆژ.، باد.) وەها، چوونەو، هۆتو، وەر، وەکوو، ها: ـــ لەولایە. (ڕۆژ.) ئاوا، با، ـــ بگرە: وادابنێ،

نرخی بکە. ــ بەستە: بەندیوار، خوێش. ــ بەرابەر: پلەی هاوکێشە. ــ بزانە: وای دابنێ.

**وابزدیان** (بار.): قەڵشینی دەست و پێیان.

**واپەر** (هەورا.، دەر.): پایەدار.

**واتا**: ئانکوو، ناوەرووک. ــ لێ دانەوە: لێکدانەوە. هاو ــ: دوو ووشە یان دوو ڕستە، واتایان وەکوو یەک بێ. ــ دۆزینەوە: لێکدانەوەی ناوەڕۆک.

**واتادار**: بەواتا.

**واتە**: وتە، گوتە، قسە.

**واتەوات**: دەنگەدەنگ.

**واتەو ویرە**: وتوویژ، گفتوگۆ.

**واتەی** (هەورا.): گوتن، ووتی، (هەورا.) واچە: بڵێ، مەواچە: مەڵێ. (فە.) بووش: بڵێ، نەووش، نەیووش: مەڵێ.

**واتر**: دوای، دوورتر، لەپشت.

**واتن** (ڕۆژ.، هەورا.): وتن، گوتن، کوتن.

**واچە**: بڵێ، بێژە.

**واچەی** (هەورا.): ووتن، کوتن.

**واخ** (کە.، باڵە.): بەداخەوە، ولاخ.

**واخووا**: دووپاتکار، گلەیی و گازاندەکار. ــ ی: دووپاتکاری، گلەیی و گازاندەکاری.

**واخوێن**: پەرستگەی ساز و ئاهەنگ، کەسانێ، کە گۆرانی بۆ مەقامبێژ دەگێڕنەوە.

**وادار** (هەورا.): بادار. ــ یی: باداری.

**وادانان**: واقرساندن، وەرگرتن، باوەڕپێکردن، پشت پێبەستن.

**وادان** (ڕۆژ.، زەن.): بادان، بۆ بەن و نیدی.

**وادانەوە**: گەڕانەوە، پەشیمان بوونەوە.

**وادەر** (ڕۆژ.): بادەر.

**وادراو** (ڕۆژ.): بادراو.

**وار** (هەورا.): خوارەوە، بانەمەڕ، هەوار، سەیرانگا.

**واران وارین** (هەورا.): باران بارین.

**وارانناو** (هەورا.): باراناو.

**وارای** (هەورا.): بارین.

**وارخوەش** (باک.): کەسێکە ماوەیەکی درێژ بێنێتەوە لە جێگایەکی خۆش.

**وارەسە**: دوورەپەرێز.

**وارە**: قەرز.

**وارە**: بەشێک، بەشێکی نرخی شتێک، کە لە چەند بەشێکدا بدرێتەوە.

**وارەوارە**: جارجارە.

**واردار** (دەر.): کووچ کووچ، سەگی لە دوورەوە پێ بانگ دەکرێ. (هەورا.) خواردنەوە.

**واردەمەنی** (هەورا.): خواردەمەنی، خۆراک.

**واردەی** (هەورا.): خواردن، خواردنەوە، (بووەرە، وەرە: بخۆ).

**واردەیۆ** (هەورا.): خواردنەوە. (فە.) نۆشکردن.

**واردن** (ڕۆژ.): خواردن.

**واردنەوە**: خواردنەوە.

**واردۆزی** (باک.): کەسێکە لە جێگا هەواری بگەڕێ.

**واردیەڤە** (هەورا.، باک.): خواردنەوە.

**واڕزین** (فە.): تووک هەڵوەراندن.

**وارستەی** (هەورا.): خوازتن.

**وارک** (ژا.، ڕۆژ.، فە.): بارۆکە.

**وارکۆر** (باک.): وەجاخ کوێر. ــ یی: وەچاخ کوێری.

**وارگەه** (باک.): هەوارگە، جێگای هەوار، بانەمەڕ.

**وارگەی بەندی**: ئۆردووگای بەندکردن.

**واڕنای** (هەورا.): باراندن.

**وارۆک**: بارۆکە.

**وارۆکە** (هەورا.): بەری چکۆلە، بارۆکە.

**واروارە** (دزە.): هێدی، لەسەرەخۆ.

**واریانەوە** (هەورا.): پاڕانەوە.

**واریاندنەوە** (هەورا.): پاڕانەوە.

**واڕیای** (هەورا.): گۆڕان.

**وارین** (دەر.): بارین. (باک.) ڕەنگ پەڕیو لەترسان.

**واز**: برینێکی پیسە لەسەر پەیدا دەبێ، کە چارە نەکرێ و کۆن بێ دەبێتە کەچەڵی. ــ لێ هێنان: بەجێ هێشتن. ــ بوون: کرانەوە. ــ لێ هێنراو: پشتگوێ خراو. ئارەزوو.

**وازانین**: ئاوا بیرکردن.*

**وازاو**: لێوڕێژە.

**وازوازی**: دەمەدەمی، جینگەنە، جەنگەنە.

**وازهاوردن**: دەست بەردان، وازهێنان.

**وازهێنان**: دەست هەڵگرتن، دەسهەڵگرتن، بەلاوەنان، خۆشبوون، لێ گەڕان، بەجێ هێشتن، وازهاوردن، دەسبەردان، دەستی خۆ ژێ کرن، دەست لێ بەردان، بەسەر چوون، ژێ گەڕیان، هەوکردن، بەخشین، دەڤ ژێ بەردان، وەبوون.

**وازی** (کە.): گەمە، گاڵتە، گەپ.

**واژ**: ئاوەژوو، پێچەوانە. وەبەران هاتنی مەڕ.*

**واژاو**: لێوڕێژ.

**واژە**: ووشە.

**واژەبەس**: مرازی پێوەندی.

**واژەر**: پارێزەر.

**واژەوەند**: وەرگەڕاو، شووم، ناپیرۆز.

**واژی**: ئاوەژوو: بەرواژی، پاشە و پێش کراو، چەواشە. ــ کردنەوە: وەرگەڕانەوەی کراس و دەرپێ و نیتر.

**وازی وازی**: کەسەرباز، سەرسەری، چەپک چەپک، دەمدەمی.

**وازیین**: دارِشتن.*

**واسە**: هەروەها.

**واسەی** (ژا.): خوواستن.

**واستن**: خوازتن.

**واشە** (بابا.، کە.، دەر.): باشق، باشۆکە، باشوو.

**واشۆر**: جلکی گۆڕین بۆ شوشتن.

**واغین** (کە.): وازیی گوویزی، گەمەی گوویزێنی، گوێزین.

**واق**: هۆت، مات، شاش، سوور، سەرسوورِماو، تەباسوورِماو ،سوور. — مان: سوورِمان، بشکڤین، سەرسوورِمان، حەپەسان، پەشۆکان، سەرلێ شێوان. — بوون: سەرسوورِمان.

**واقاندن**: واقەواق کردن، واقانن.

**واقەواق**: — ی ڕێوی و منداڵی ساوایە، ویقەویق، (دەر.) ویقەویف. — کردن: واقاندن.

**واقمان**: سەرگەردان بوون، سەرسوورِمان، هیبیرِمان.

**واقماو**: مەدهۆش.

**واق وور**: تاساو. (باک.) تەبا، مات، سەرگەردان. — مان: (باک.) بشکڤین. (باد.) بەهتین. — کردن: (باک.) بەهتاندن. بشکڤاندن، تاساندن، دەلیاندن، سەرگەردان کردن.

**واق وورمان**: دەلیان، سەرگەردان، (باک.) بلبسیین، پشکزان، پشکڤیین، تێ رامان، دامان.

**واق وورماو**: پەشۆکاو.

**واقین** (باک.): مرقەمرقی کەروێشکێیە.

**واک**: وانێک، هەرامە، هیین، فلان.

**واکەواک** (خۆ.، ڕۆژ.): دەنگ و گمەی کۆترییە، گمەگمی کۆتری.

**واکێش**: باکێش.

**واگر** (موک.): دانەر، خەمڵچی، وەرگر.

**واگرتن** (ڕۆژ.): باگرتنی سەگ، بەبابوونی سەگ، (موک.) وەرگرتن، دانان، خەمڵ کردن، خەملاندن.

**واڵا**: کاڵا، پارچە، تاڵ و واڵای بووکی. پارچەی ناوریشمی. ناوەڵە، بەتاڵ، سەرنەپۆشراو. خوشک.

**واڵامەن** (هەورا.): سەودا، سەوداسەر (لە عەشق و نەخۆشی دا) بەکاردەبرێ.

**واڵامەنی** (هەورا.): بیرۆ.

**واڵاوێت**: پاڵێوراو.

**واڵە**: شەیدا. (کە.، ڕۆژ.) والح. (شە.) خوشک.

**واڵە**: ووردەواڵە. خوشک.*

**واڵەبێژ** (موک.): ناڵەبێژ، چتی وردکراو بە پەرۆ دابێژتن.

**واڵەزا** (هەورا.): خووارزا، خوشکەزا.

**والح** (کە.): لە (واڵە) وە هاتووە، شەیدا، سەوداسەر.

**واڵێ** (هەورا.): خوشک، (فە.) خویشک، دیدە.

**والیینۆ** (باک.): وەک، وەکو، هەروەکوو.

**وام**: ئەوەتام. بە بیروڕای من (وام پێ چاکە).*

**وامانگ**: داماگ، داماو.

**وامی** (هەورا.): بادام، باوی.

**وان**: ئەوان. — بێژ: مامۆستا. جێناوی کەسی کۆی نادیار، وانە. ئاگادار، پاسەوان، بەخێوکەر، ڕەنێوهێنەر، پارێزگار، بەڵام بە دووای ووشانەوە دەنووسێ، بەدووای هەر ناوێکەوە بنووسێ واتای پارێزەری پێ دەبەخشێ وەک: باخچەوان، باخەوان، بەرخەوان.

**وانان** (زەن.): خووێندن.

**وانای** (هەورا.): خوێندن.

**وانە**: دەرز. وان، پارێزەر، بێبەر.

**وانەبێژ**: مامۆستای فێرکردنی خوێندن.

**وانەر**: پارێزەر.*

**وانەک**: وانێک، هەرامە، فلان، کابرا، جوامێر، جوانمێر، هین، داک.

**وانەیێ**: وەنەیێ، ئاگاداری، پابەری، پارێزگاری.

**وانن**: خوێندن.

**وانگ** (دەر.): بانگ.

**وانی** (هەورا.): بخوێنە، (باک.) هەروەکوو، ئاوا، بەو جوورە.

**وانێک**: وانەک، هەرامە، گۆڕین، جوامێر، جوانمێر، هین، واک، کابرا.

**وانییە؟**: ئایا ئاوایە؟ ئەوێ ئاوایە؟.

**وانییل** (باک.): بەری دارێکییە.

**واوەیلا**: هاوار، ئامان، چریکە، قیژە.*

**واوڵ** (دەر.): بادار.

**واوشە** (هەو.): ئامێز، باوەش.

**واووە**: ویڤە، ئەولا، ئەملا، هێڤە، بێرەدا.

**واووڵ** (ڕۆژ.): بێکار، شلەپەتە، بەشبراو.

**واه** (هەو.): واقمانە، ئاها، هاها.

**واهە** (باک.): ئەوەتا، هۆوەتا.

**وای**: وا، بۆ هاوار و دادە، وەی، ئای، ئۆ، ئۆە، ئەی، ئاخ، ئۆف، ئاە، پەرۆش، داخەکەم. — لەمن: وای لمن، ئەمزۆ داخەکەم، بەدبەخت خۆم. — کردن: داخ دەربڕین.

**وایە**: (کە.) ئەیوا. (هەورا.) پاسەن، وەهایە، ڤایە، ڤەیە،(دەر.) وەهاست، ئاوات.

**وایستن** (دەر.): ویستی.

**وایسۆ** (باک.): ئازا.

**وای لمن ئەمزۆ**: داخەکەم.

**وایم** (دەر.): چەقالە، شوواشینک، کە دارێکی کێوییە، داری کاڵەشین.

**واین**: هەڵاتن، ڕاکردن، ئاوە هاین ئێمە.*

**وایوای**: وەیوای، ئەیوای.

**وایی** (دەر.): فراری کردن، هەڵاتن.

وابین (دەر.): هەلاّتن.

وە (هەورا.): بۆ، لێ، وەلای تۆ: بۆلای تۆ، بە، ب: ـــ بەرزی. کەلە نێوەڕاستی دوو ووشە یا پتر دابێ، دەیخاتە سەریەک بە ووشە و واتاوە. (باک.) ئەو، ئاوا، (یەز.) لێ، واز. ـــ بوون: لێ بوونەوە، واز لێک هێنان. بە: وەحەواکەوت: بەهەوادا ڕۆیشت. (باک.) لە، نێوە کورت کراوەتەوە، هۆوەتا.

وەناگاهاتن: هوشیاربوونەوە. ـــ هێنان: ڕاکرن.

وەبا: ئازار، قران، تاهۆ.

وەباڵ: سووچ، تاوان، وەباڵ، وەمەل، وەکن، ڕەنج کێشە، ئەرک، گرانایی، نۆباڵ، ئەوباڵ، ڤەباڵ. ـــ ت بەئەستۆم: سووچ یا تاوانت لەسەر من.

وەباڵبەر: تاوانبار.

وەباڵکار: تاوانبار.

وەباڵکەر: گوناهکار، سووچدار.

وەبەران (ڕۆژ.): مەڕی بەتەگە.

وەبەرخستن: وەبەرخستنی بەشێک لە جیاتی بەشێکی دیکە لە ژمێرەدا.

وەبەردان: دانبەر.

وەبەرکەوتن: پێ بڕان، دەست کەوتن، لێدران، ئەنگێوران، لبەرکەتن.

وەبەرگرتن: لە ژێر ڕاگرتن.*

وەبەرهاتن: هاتنبەر، بەکەڵ بوون.

وەبەندانەوەی برین: کولانەوەی برین و تازەبوونەوەی.*

وەپاڵ: وبال.

وەپاڵدرا: خراوەپاڵ.

وەپێش کەوتن: بەش دەست کەوتن.

وەتاخ: سالۆن، ژووری دانیشتن.

وەتاک (ڕۆژ.): کراوە، ئاوەڵە، والاّ. بەتاک.

وەتاڵ: بەتاڵ، بۆش.

وەتانا چوون (ڕۆژ.): زۆر پێ هەڵکوتن.

وەتاو (کە.): بەپەلە، بەتالووکە.

وەتە: گون، هێلکە. ـــ با: فتق.

وەتن (فە.): کوتن، گۆتن.

وەتۆ (باد.): ئاوا، وەها، وەسا. ئەوتۆ، هۆتۆ، ئاوا.

وەتۆڤ (ئامێ.): ئاوا، وەسا.

وەتی: لە ـــ: لەکاتی، لەوەختی.

وەج (هەورا.، کە.، هەو.): گۆڕینەوە، بریتی، نرخ، زانەوێر، (کە.) وەجەڵ.

وەجاخ کوێر: بێ دووانەدن، (باک.) دارکۆر، بێ دوایی، بێ شوێن، بێ مناڵ. ـــ ی: بێ مناڵی.

وەجەڵ (کە.، ڕۆژ.): کورتییەکەی (وەج) ە، نرخ، بەهایی.

وەج بە وەج (هەورا.): یێک گۆڕینەوەی چتمەک و دەخڵ و دان و میوە و چتیتر.

وەجێ (ڕۆژ.): بەجێ.

وەچ (جا.، کە.، ڕۆژ.): چووبچکەی داران، ئەو کەدە چکۆڵە و ئاسکانەیە، کە لەبن لکان دەری دەکات. کارتەی چکۆڵەی گیا و دارانە، کە لەبن لق و پۆپەکەی دەری دەکات. نۆکەر و دەست و پێوەندان.

وەچە: (دەر.) وەشە. برازا. ئامۆزا. چووکڵی تازەی تووتنێیە، کارتەی گیا و دارانە. ـــ خستنەوە: مندااڵ لەدوو خۆ بەجێ هێشتن.

وەچچە: وەچە (ڕۆژ.): حەچە، هەچە، بۆ ئاژۆتنی کەر و ئێستر بەکاردەبرێ.

وەچکە (دەر.): بەچکە، بێچوو، منداڵ.

وەچکوو (باد.): وەکو.

وەحە: حۆلە، وحە، گچە، بۆ ئاژۆتنی ڕەشەوولاّخان بەکاردەبرێت.

وەحەوەحە: وحوحە.

وەخت: کات، (ع.) وەقت.

وەختە: نێزیکە.

وەخران (خۆ.): وەدرەنگ کەوتن، وەدووکەوتن. ـــ دن: وەدواخستن، وەدرەنگ خستن.

وەخشوور: پێغەمبەر.

وەخۆ: ئامادە. (باک.) بەدییل. ـــ کەوتن: ئامادەبوون، کەوتنەخۆ، خڕکردنەوە، خۆ ئامادەکردن، خۆسازکردن، بەرخوەکەتن. ـــ هاتنەوە: وەهۆش هاتنەوە، بێداربوونەوە، سەرخوە ڤەهاتن. ـــ گرتن: خستنەمل خۆ، دەمان، بەدەمان گرتن، دامان، دەستەبەری.

وەخۆگر: لەخۆگر، دەستەبەر.

وەخۆگرتوو: دەستەبەر.

وەدانان: بڕوانە: وادانان.

وەدە (خۆ.): بدە.

وەدەرخەر: دەرخەر.

وەدەرخستن: وەدەرنان، بەرزانی، (باک.) بەرهەس کرن، دەرهێنان.

وەدەرکەوتن: لوای بەرەوە دەرچوون، چوونەدەرەوە، دەرپەڕین.

وەدەرنان: دەرکردن، وەدەرخستن، دەراڤێتن.

وەدەست خستن: بەدەست هێنان. ـــ هێنەر: ئەوەی شتێک بەدەست دەهێنێ.

وەدەست کەوتن: پێ بڕان، دەست کەوتن.

وەدەست و پێ کەوتن (موک.): پەل کوتان، پێ گەڕیان، دان پێ، (باک.) دان پەی.

وەدووکەوتن: وەشووێن کەوتن، ڕەدووکەوتن، سەرلەدوونان. (خۆ.) ڕەدووکەوتنی ئافرەت، وەشووێن کارێک کەوتن.

وەدووکەوتوو: ڕەدووکەوتوو.

وەدی: پێشبینی. ـــ هاتن: وەڕاست هاتن، هاتنەدی. ـــ هێنان، بەدی هێنان، وەڕاست گێران، بەچاوکردن، هێنانەدی، دەرپەڕاندن.

وەدیار: ـــ کەوتن: دەرکەوتن و بینران.

وەر: (هەورا.) خۆر، ڕۆژ، (هەورا.) پێش، ڤەر، بەر، تیشکی ڕۆژ. (باک.) پارچەیەکی چکۆلەیە، یانیش دەورەدانێ نیشان دەدات. ـــ بوون:

هاتنە خوار. پێ ــ کەتن: دەورەی (بازنە) یەکی دان، خولدان. وەکو، وا، ئاوا، وور، (باک.) وەرە، (فە.) بەر (دەور و پشتی ئەندامی شەرمی مرۆڤانە).

**وەرا** (باک.): ئازا.

**وەراز**: (زرا.) ئاودێر، ئاودێری برنج و ئیدی. (کە.، ڕۆژ.، دەر.) بەراز.

**وەرام**: ــ کردن: پاشەکەوت، ئابووری، (باک.) وەرسیف. ــ کار: مەبەست. ــ زان: پسپۆری، وەرامی، وەرامناسی، ئابووری زان، ئابووری ناس.

**وەرام ناسی**: پسپۆڕێتی.

**وەران**: هەڵوەران. (فە.، کە.، زەن.) بەران.

**وەرانبەر** (دەر.): بەرامبەر.

**وەراندن**: هەڵوەراندن، تەکاندن، هەژاندن، هێنانەخوارەوەی میوە.

**وەڕاندن**: (باک.) ئەوتاندن.

**وەرانن**: وەراندن.

**وەراو**: (کە.، ڕۆژ.) بەراو.

**وەراوەر** (هەورا.): بەرامبەر.

**وەرە**: فەرمانە لە هاتنەوە، (ئۆ.، ڕۆژ.، دەر.) بۆ. (ئەردە.) بێ، (فە.) بەر، بێرە، (لک.) بووریێ، (هەورا.) بۆرێ، (باک.) ڤەرە، دەر. (هەورا.، کە.، ڕۆژ.) بەرخ.

**وەڕە**: حەپەی سەگییە، کە لە دوورەوەبێ، حەپە.

**وەرەتاو**: (هەورا.) ڕۆژەتاو.

**وەرەچەم ئاوەرە** (هەورا.): چاوبرسی.

**وەڕەز**: بێزار، (بل.) کەوەڕێ. لۆس، (هەو.) جارس، وەڕەس، (کە.) وەرس، وەڕز. ــ بوون: بێزاربوون. ــ کردن: هەراس لێ هەڵگرتن.

**وەڕەزەن**: میوەیەکە، کە بۆ ووشک کردنەوەبێ.

**وەڕەزی**: بێزاری.

**وەڕەس**: بێزار، وەڕەز. ــ بوون: بێزاربوون. ــ کردن: بێزارکردن.

**وەڕەسی**: بێزاری.

**وەرەسیان** (باک.، ڕۆژ.): کەوتنەخوار، ڕژیشتن. ــ دن (باک.، نەه.): خستنەخوار، وەرێ خستن.

**وەرەک** (فە.): کە دووکەس بە جووتە سواری وولاخێکی بن بەوەی پێشەوە دەڵێن وەرەک، بەوەی پشتەوەش دەڵێن پشتەک.

**وەرەگن** (کە.، ڕۆژ.): بەرگن.

**وەرەم** (ڕۆژ.، هەورا.، کە.، هەو.): دیق، دەخەز، دەرهەم.

**وەرەما** (ڕۆژ.): بەرخەمێ.

**وەرەماس** (زەن.، جەبا.): ئاسک.

**وەرەمدار**: دیقدار، دەخەزدار، سنگ ژار، وەرەماوی.

**وەرەن** (کەل.، زەن.): بەران.

**وەرەنیا** (هەورا.): بیراز.

**وەرەندیل**: جوورە تفەنگێکی کۆنە.

**وەرەنێر** (ڕۆژ.): بەرخەنێر.

**وەرەوان** (هەورا.): بەرخەوان.

**وەرەوە**: (هەورا.) بۆرێوە، (دەر.) بۆرەوە، (ئەردە.، سن.) بێرەوە.

**وەڕەوەڕ**: حەپەحەپ، دەنگەدەنگی وەڕینی سەگانە، ئەوتەئەوت، هەوت.

**وەرەوەران** (ڕۆژ.): بەرخێکی نێر، کە بۆ بەران هەڵدەگیرێت.

**وەرەوەن** (شو.): بەران.

**وەرب**: بەفر.

**وەربازن** (دەر.): دەستەوانەی ژنان.

**وەربوون**: هاتنەخوار، سەرەوژێربوون.

**وەربێژ** (باک.): هێڵەک. ــ کرن: لە هێڵەک دان، بە هەواو بەفیز کردن.

**وەرپێچان**: تێکەوەپێچان، لوول دان.

**وەرت** (باک.): جێنشین، جێگر، جێ نیش. ــ ی: هۆزێکە.

**وەرج** (کەل.): پێش.

**وەرجس**: وەرزش.

**وەرچەرخان**: وەرگەڕان، ئاوەژووبوونەوە.

**وەرچەرخاندن**: ئەمدیوە و دیو پێ کردن، وەرگێڕان، ئاوەژووکردنەوە، وەرگەڕاندن.

**وەرخستن**: نوواندن، خەواندن، خەفاندن، وەرماندن.

**وەرد** (دزە.، کە.): خەتی دوورهەمە بە سەر شۆدا لێ دەدرێتەوە، کێڵانی دووەمجارە، دووخەت، زەوییەکە جارێکی کێڵرابێ و، کەڵە جاری دووەمدا بیکێڵنەوە. ــ ی پێ دەڵێن. خەپار، (کە.) شووم. ــ بڕین: زەوییەکە ئەمساڵ بیکێڵن بەڵان نەیچێنن. (هەمە.) لەگەڵ، لەیەک.

**وەردا** (هەورا.): بەرووداکەوتن.

**وەردان**: دووبارە کێڵان، وەردانەوە.

**وەردانەوە**: وەردان.

**وەردانێ ڕەش** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**وەردەک** (باک.): سۆنە، مراویی نێر.

**وەردەوبین** (هەورا.): بەربوونەوە، کەوتن.

**وەردی**: لەوێ، ئینجا.

**وەردێ**: ئەوی.

**وەردێنە** (باک.): بازی، ئابینک. ــ ی ئانی: کەسمەبڕ. (هەو.) بادا. پنچە گیایەکە لە ڕۆخ ئاوان شین دەبێ، پەلکی وەکوو بی وایە، لاسکی سووروشینە وەک لاولاوە درێژ دەبێ و کێوییە، بە کوتراوی و کوڵاوی لەسەر چاوی ووردێنە دادەنرێ زۆر باشە.

**وەرز**: ــ کردنەوە: گەڕانەوەی جووتی، ساڵ، کاتی بەروبووم هەڵگرتن. (باک.) شیناوەردی، بەرووبۆ، ڕەوار.

**وەڕز** (کە.): وەڕەز. ــ بوون: بێزاربوون.

**وەرزان** (خۆ.): جوولان، ژیمناستیک.

**وەرزانەوە**: جوولانەوە، وەرزش کردن.

**وەرزاندن** (هەو.): خۆشکردنی چەرم و ئیتر، خاراندن، جوولاندن.

**وەرزایەر** (فە.): بەری مرۆڤانە.

**وەرزە** (هەورا.): هەستە.

**وەرزش:** وەرزشت.

**وەرزگ** (ڕۆژ.): بەرزگ، نەنکای زگ.

**وەرزیار:** کشتوکاڵ چێن، دروێنەکەر.

**وەرزێر** (هەورا.، جا.، کە.): سەپان، پاڵە. ـــ ی: سەپانی، پاڵەیی.

**وەرزین:** (خۆ.) بزووین، جووڵان، وەرزینەوە. (هەورا.) خۆشبوونی چەرم، خاران.

**وەرزینەوە** (خۆ.): جووڵانەوە، ژیمناستیک.

**وەرسان** (باک.، شەم.): (باک.) وەرسین، بەربوونەوە خوواریّ. ئاو هاتنەوە لە گان کردن و نی دیکەدا.

**وەرسەگ** (فە.): هێزی لەش نیشاندان، ژیمناستیک. ـــ کردن: وەرزانەوەکردن.

**وەرسەلە** (باک.): ماسولکە.

**وەرسووڕانەوە:** وەرگەڕانەوە، گەڕانەوە، بادانەوە، وادانەوە.

**وەرسیان** (باک.): کەوتنەخوارەوە.

**وەرسیانەن** (باک.، لە.): ئاوهێنانەوە لەکاتی گان و نی دیکەدا، خستنەخووار.

**وەرسین** (باک.): بەربوونەوە، ئاوهاتنەوە لەکاتی گان کردن و نی دیکەدا.

**وەرشەو:** گوڵێکە ڕەنگی شین و بیّ بۆنە. سەماوەری ـــ: جۆرە سەماوەرێکە.

**وەرقە** (کە.): ئارام، قەرار. ـــ گرتن: ئارام گرتن.

**وەرک** (دەر.، فە.): بەرخ.

**وەرکەمەر** (هەورا.): گیایەکی بۆنخۆشە لەبن چیایاندا دەردێت، کەمەر، بەردە، دەر: پێش.

**وەرکەوە:** بنوو، بخەوە.

**وەرکەوتن:** نوستن، چاوچوونەخەو، خەوتن، خەفتن، بووسان. (هەورا.) ووتەی. بۆ سەگییە.

**وەرکەوتوو:** نوستوو، خەوتوو.

**وەرکووت** (هەورا.، کە.): بەرکووت (نی دەغڵی).

**وەرکووڵ** (هەورا.): بەرکۆژە، بەرکووڵ.

وەرگ

**وەرگ** (هەورا.): گورگ.

**وەرگە** (باک.): هەروەکو، وا، ئاوا. (کە.، ڕۆژ.) بەرگە. ـــ گرتن: بەرگەگرتن.

**وەرگەڕان:** لەدین ـــ: واز لە ئایینی خۆ هێنان، (زمن.) هەڵپلان، وەرگێران، چەرخان، وەرچەرخان، هەرپلان. ـــ ی جومگەکان، لەڕێ لادان، لە ئایین لادان، ڕژان، سەرەوژێربوون.

**وەرگەڕانەوە:** وەرسووڕانەوە، بادانەوە، چۆپکردنەوە، زڤڕین، پۆپسانەوە.

**وەرگەڕاندن:** گەڕاندنەوە، وەرگێران، دووبارە ناردنەوە، هەرگەڕینە، وەرچەرخاندن، هەمبلاندن.

**وەرگەڕاو:** وەرگەڕیاو، لیوی، سرکەی ـــ ە بۆ شەراب، هەڵگەڕاو، برنج لەبەر بیّ ئاوی ـــ ە بەداڕووجان.

**وەرگەڕاوە:** هەڵگەڕاوە.

**وەرگر:** گیرندە، (باک.) بلێتچی، وەرگێڕ. لیّ ـــ.

**وەرگرتە:** وەرگیراو، ئەوەی، کە دیّ و وەردەگیریّ.

**وەرگرتن:** وەرگرە، هێنانەدەس. (باک.) دانان، بەکاربردن، پسیّ لەبەرکردن.

**وەرگرتنەوە:** گەڕاندنەوە.

**وەرگێڕ:** (باک.) پاچڤان، پاچڤەزان، (باک.) پێچڤان، ئەوکەسەیە، کە چتێکی بچەرخێنیّ بەهەر لایەکیدا.

**وەرگێڕان:** (هەورا.) هۆرژگیلیای، هۆرگیلای، (باک.) پاچڤەکرن، دەرنەقۆت کرن، دەرنخوین کرن، سەرنخوون کردن، سەرنشیۆکرن، قلّپ کردنەوە. ـــ دن.

**وەرگێڕانەوە:** هەڵگێڕانەوە.

**وەرگێڕاو:** وەرگێلاو، ئاوەژووکراو، ئەودیوئەم دیوکراو.

**وەرگێڕزکە:** منداڵێکە کاری پێبکریّ لەبەردەستان، وەروپرک، هەڵگێرکە.

**وەرگێلاو** (هەورا.): ئاوەژوو، وەرگێڕاو.

**وەرگیر:** وەرگر.

**وەرگیراو:** قبووڵ کراو، هەویان.

**وەرم** (هەورا.): نوستن، خەو، خەون. (زمن.) ئارامی، ناسوودەیی.

**وەرماڵ** (ڕۆژ.): بەرماڵ، پێش ماڵی.

**وەرمەاندن** (باک.): ئاوساندن، هەڵامساندن، وەرمین. (هەورا.) نووانددن، وەرخستن.

**وەرمەزیار:** هۆزێکی کوردە.

**وەرن:** فەرمانی هاتنە بۆ چەند کەسێکی بەردەست و ئامادە. بێن، بەون.

**وەرنیش:** (باک.) بۆراک.

**وەرواو** (هەورا.): بەفراو.

**وەروا** (دەر.): بەریا.

**وەروانە** (هەورا.): بەروانکە.

**وەروانکە** (هەورا.): بەروانکە.

**وەروە** (هەورا.): بەفر.

**وەروەر:** دەمانچە.

وەروەر

**وەروەرە:** (خۆ.، هەو.، ڕەوا.): بەفرماڵ. بێڵی گەورە و پان بۆ بەفرماڵین، شەپالۆخ.

**وەروەسەر** (هەورا.): بەفربەسەر.

**وەروەوەریّ** (هەورا.): بەفرەخۆرە، خۆخۆرکە، جوورە باڵندەیەکە.

**وەرۆبین** (ڕۆژ.): بەربوونەوە، (کە.) بەرەوەبوون.

**وەرۆژ** (دەر.): بەربەرۆچکە.

**وەرووبەرەی** (هەورا.): پێش دەرگا، پێش دەرگانە.

**وەرووچیش** (هەورا.): بۆچی، لۆچی.

**وەرووداسانەوە:** کارێکە، کە کەسێک لەبەر یەکێکی دی بە ناچاری بیکات و لە ڕووی نەییّ نەیکا. *

**وەرووینان** (هەورا.): بەرمالان.

**وەروپرک** (کە.): وەرگیرکە، منداڵێکە بتوانی هاتوچوو بکا.

**وەرهاتن:** هاتنەخوار.

**وەرهەڵپیز:** (هەورا.) بەرمەشکە (دۆدانکە).

**وەرێ:** بەرێداجمان. ـــ کەوتن: بەرێ کەوتن، ڕەوان بوون، ناردن. ـــ کردن: بەرێ کردن، خستنەڕێ، ڕەوان کردن، ناردن، ڕێخستن، ڕێکرن.

**وەریەقە** (دەر.): بەریەخە، بەروانکە.

**وەرێخستن:** ناردن.

**وەریس** (هەورا.): گوریس. (باک.) ڕستن.

**وەرین:** هەڵوەرین (گوڵ و گەڵا و چتی ناسک). (باک.) بەشێکە لەکرداری هاویەشی.

**وەرێنان** (هەورا.): پێشوونیان.

**وەرێنان** (هەورا.، کە.): پێشینان.

**وەرینە:** نەخۆشی، ورێنە.

**وەریو:** هەڵوەریو.

**وەڕین:** عەوعەوکردن، حەوحەوکردن، گەڤین، ئەوتیین. (باک.) ڕەڤین، حەپاندن، ڕەیین، ڕیلین، سەگوەڕ، هەوت کرن.

**وەز** (هەورا.): گوێز. (زا.) ئەمن، ئەز. (ڕۆژ.) بەز.

**وەزا** (باک.): لاواز.

**وەزانین:** هەڵێنجان.

**وەزە:** پێوەدان (مار و دووپشک و ئی دی)، لاواز.

**وەزەران** (هەورا.): دابەزین.

**وەزەراندن** (هەورا.): دابەزاندن، تاڤگە، ڕێژگە، هەوراز، هەڵدێر، زیان، پێوەدەر (بۆ مار و دووپشک). (کە.) ئامادەبوونی مار بۆ پێوەدان.

**وەزەکۆر** (هەورا.): کوێرۆک.

**وەزەنە:** شین، زیان. ـــ گەیاندن: زیان گەیاندن.

**وەزەنی:** ئازار پێ گەیاندن.

**وەزرین** (ڕۆژ.): ڕاڤەکردن، (کە.) دەرخستن، هەڵڕشتن.

**وەزگ:** خەفەت. ـــ وان: خەفەت خواردن، دەردەداربوون. ـــ گرتن: ڕق لێهەڵگرتن.

**وەزی** (هەورا.): گوویز.

**وەزیر:** شالیار.

**وەزیری ڕابەری:*** وەزیری ڕێنیشاندان، مەبەست لە وەزیری ڕاگەیاندن بووە.

**وەزیری ڕێپێدراو:*** وەزیرێک، کە بۆی هەبێ قسەیەک یان کارێک بکات و ئەنجامی بدات.

**وەزیری کشتوکاڵ:*** وەزیری لێپرسراوی هەموو کاروبارێکی، کە پەیوەندیی بە کشتوکاڵ و چاندنەوە هەبێ.

**وەزین:** هەڵبەزین، هەڵکردنی باو ئیتر، بەیەک گەیشتن.

**وەژەب:** بست.

**وەژوورکەوتن:** چوونەژوور. (هەورا.) ئامادەچووەر.

**وەس** (باک.): ڕەوش، شێوەی ڕۆیشتن. (هەورا.): بەس، ـــ کەرۆ: بەس بکە، دەست هەڵگرە.

**وەسا** (باد.، ئامێ.): ئەجووره، ئاوا، وەها، ئەوتۆ، هۆتۆ.

**وەسان** (باک.): بەیەک ئەندازە سەخت لە فشار و زەحمەتدا بوون.

**وەسە:** بروانە: وەستە.

**وەسەر:** ـــ کەوتن: سەرکەوتن، چوونەسەرەوە، بەرزبوون، دەرچوون، ڕزگاربوون. ـــ کردن: بردنەسەرەوە. ـــ خستن: بردنەسەر.

**وەسەرکەوتوو:** سەرکەوتوو.

**وەسپ:** پەسن. ـــ کردن: پەسن کردن.

**وەستا:** مامۆستا، زانا، پیشەزان، زانای پیشە، پیشەگەر. (باک.) مامۆستا. ـــ بوون: ماندووبوون، ماندوو.

**وەستان:** ـــ ی دڵۆپە، چک بوون، ڕاوەستان، (هەورا.) مەوای، وێستان. (فە.) ماندوێتی، ماندووبوون، پەک کەوتن. بەخۆوەستان: بەرگەگرتن. لێ ـــ: تەماشاکردن. ـــ ی دڵۆپە: چک بوون، وشک بوون، چک کردن، وشک کردن.

**وەستاندن** (باک.): بوەستینە، ماندووکردن.

**وەستاو:** ماندوو. ـــ ی: ماندوێتی.

**وەستای** (باد.): ماندوو.

**وەستایی** (باک.): وەستاوی، ماندوێتی.

**وەستە:** داواکراو، بانگ کراو.

**وەستێ** (باد.): لەوەتی، ـــ دووهۆ: لەوەتی دوێنێ.

**وەستیان** (باک.): ماندووبوون (بوەستە).

**وەسڵە:** پەدەگ.

**وەسمە:** دەرمانێکە وەکوو خەنەیە، پرچی پێ ڕەنگ دەکرێ، مەیلە و ڕەشی دەکا.

**وەش** (هەورا.): (دێرسم.) باش، چاک، وەکو، وێنەی. ـــ وەرای: خۆشرابواردن. خۆش. ـــ بۆی: بۆنخۆش، بۆ بەخشینیش بەکاردەبرێ. ـــ بوون: بەخشران. ـــ کردن: بەخشین. دەنگدانی کەرانە بۆ وەستاندن.

**وەشاردن:** (جەبا.) کوشتن، شاردنەوە.

**وەشارکە:** حەشارگە، شاردنگە، سەنگەر، سیپە.

**وەشان:** ڕوشان، وەشین، دڵۆپە چک بوون.

**وەشانەوە:** (ڕەوا.) چک بوون، وەستانەوەی دڵۆپە و بارانەیە، شیاو، شایان، لێ وەشانەوە، چاوەڕوانی لێکردن، پێدا ڕاپەڕموون. تەکاندن، بووەشێنە.

**وەشاندن** (باک.): (هەورا.) شانای، ڕاچاندن، ڕاوەشاندن، هەژاندن، دەست وەشاندن: لێدان، لەرزین. تیغ وەشاندن: شمشێر وەشاندن. چاندن، پژاندن، دڵۆپە ـــ: چک بوون، لاق و دەست، دار و ئیتر وەشاندن، جنۆکە دەستی لێ وەشاندووە.

**وەشە:** وش، بۆ دەرکردنی کەرێ بەکار دەبرێ، بۆ لادانی کەرێ لە چتێک یا لە شوێنێک. (دەر.) وەچە.

**وەشمن** (هەورا.، کە.): بارانێکە بەدەم باوە بباری، بای زۆر بەهێز، باوێزان.

**وەشت:** (دەر.) باوباران. (فە.) بارانە. (جا.، کە.، زەن.) بای شەماڵ، هورە.

**وەشتاوی:** ماندوویّتی.

**وەشتر** (هەورا.): خۆشتر، وەشتەر.

**وەشڵە** (هەورا.): خۆزگە، ـــ ی بەمن: خۆزگە بە خۆم.

**وەشکار:** دڵپاک، لەخەڵک خۆش بوو.

**وەشن** (دەر.): وتن، کوتن.

**وەشۆ** (دەرس.): باشە، چاکە. (هەورا.) جووان.

**وەشی** (باک.): هێشوو.

وەشی

**وەشیاگ:** چێنراو.

**وەشین:** تەکاندن، داوەشاندن.

**وەشێن:** وەشێنەر.

**وەشێنەر:** ئاوێژەر، فڕێدەر.

**وەفر** (جا.، کە.، فە.، ڕۆژ.): بەفر.

**وەقرە** (کە.): پشوودرێژی.

**وەقی** (باک.): شەشەمین: رچەی حۆقەیە.

**وەک:** واکینۆ، وەکوو، فەنا، وەر، چەشن، وەکەهەڤ: پێکەوە. ـــ خوە: وەک خۆی. ـــ تۆ: وەک تە، وەکەتە.

**وەکات** (هەورا.، دزە.، باک.): بەڕاستی، تەقەس.

**وەکار** (کە.): بەکار.

**وەکاز** (هەورا.): کاشۆ، قوونەداغ، جوورە گزچانێکە، شاکۆل، (باک.) قریسک.

**وەکوجیە:** (فە.) جووری چەسە.

**وەکۆکردن** (موک.): کۆکردنەوە.

**وەکوو:** هووسا، داکینۆ، وەچکوو، وەکی، وەک، وەر، فەنا، مینا، وەرگە، ناسا، ئاسایی، مامز، وەی، چمان، ئال، وا، وێ، هەڤری، هەڤتۆنە، هۆسە، هۆلێ.

**وەکی:** وەختێکی، کە، وەکوو، کاتێک، دەمێکی.

**وەکیەک:** وەکوویەک، هاوتا، وەڵامدانی دڵە، سرووش.

**وەگر:** دانەر، واگر، خەمڵچی.

**وەگرتن:** خەمڵ کردن، دانان، خەمڵاندن، داگرتن.

**وەگی** (ژە.): بڵێ، بێژە.

**وەلا:** ـــ کەوتن: هەلاکەوتن. (کە.) ئاوەڵە، واڵاکراوەوە، لادان. ـــ داهاتن: بەلاداهاتن، بەربوونەوە و کەوتن و مردن.

**وەلابیەی** (هەورا.): بڵاوبوونەوە، تەنینەوە.

**وەلات** (باک.): وڵات.

**وەلات پارێز** (باک.): نیشتیمان پەرست.

**وەلاتێنی** (باک.): وڵات پەرستی، نیشتیمان پەرستی.

**وەلاتی** (باک.): وڵات پەرستی.

**وەلاداهاتن:** بەلاداهاتن.

**وەڵام:** وەڵامدەر، پێ ڕاگەیین، ڕاگەیین، ئاگادەر، باخیر، پەیام. (ڕۆژ.) پەرچ، بەرسیف. (باک.) ڤەگێران، وەڵام. (باد.) بەرسڤ. قازانج. ـــ ی کارێ خۆی نازانێ. ـــ دەر: وەئاگاهێنەر، وشیارکردنەوە، وشیارکەرەوە. ـــ دان: بەئاگاهێنان، لێ ڤەگێران. ـــ ی ناخۆش. جگەربڕ، جەرگ بڕ، خوێن مژ.

**وەڵامە:** ڕاڤەکردن.

**وەڵامبەر:** پەیام نێر. نامەبەر.

**وەڵام پرسین:** پرسگە.

**وەڵام دانەوە:** دەنگ کردن.

**وەڵامدەر:** پەیامدەر، بەرسڤدەر، هەریدەر.

**وەڵامکردن:** ڕاگەیاندن.

**وەڵامنامە:** نامەی ڕاگەیاندن.

**وەڵامنێر:** پەیامنێر.

**وەلانان:** لابردن.

**وەلاو** (هەورا.): بڵاو.

**وەلاوە** (هەورا.): بەلاوە.

**وەلە:** وحە، وح.

**وەلەک** (هەورا.): وەکاز.

**وەڵەکە** (باڵە.): (شار.) وردەوەڵ، هەلاش، ئەو وردە دارانەیە، کە لەسەر ئاڵوداران دادەنرێ.

**وەڵەو** (زەن.): کار، کاریلە.

**وەڵگە** (هەورا.): بەجوانترین و نایابترین کچێکی دەڵێن، کە کچی پاشایان بێت.

**وەڵس** (هەر.): ماڵات، وەڵسات.

**وەڵنگ** (فە.): پەلک، گەڵای دار و گیایان.

**وەلوەلە:** شۆڕو هەراهەرا.

**وەڵوەڵە** (ڕۆژ.): وڵوڵە.

**وەڵۆڵە** (هەورا.): وردەی قەزوانی ئاسک.

**وەڵێ:** بەڵان، بەڵام.

**وەڵێن:** پێشوو.

**وەڵێنە:** پێشەکی.

**وەڵێنە** (هەورا.): بەرایی، پێشایی، پێشەوە.

**وەڵیفەت:** سەرقەڵەمانە، دیاری.

**وەڵیقەت** (هەورا.): بەرتیل.

**وەن:** (هەورا.) قەزوان، ئازا.

**وەناخ** (هەورا.): دووشاخە، گەرووەخڕە.

**وەناق** (شا.، بابا.): گەرووەخڕە، دووشاخە.

**وەنەبێ:** وانەبێ، نەوەکوو وابێ.

**وەندیک:** شووشە.

**وەنەوزە:** ـــ دان: (هەو.) بووژانەوە، لەبیرەخەوچوون، گورگەخەو، بەدانیشتنەوە خەوهاتن، خەمەکوتکێ، قنگەخەو، خەوەپیشۆک، بەدانیشتنەوە خەوبردنەوە. (شن.) بووژان، بیرەخەو، بۆژین، (بابا.) وەنەوژە، خەوەنووچکە، (ڕۆژ.) پینۆک (هەو.) خەوەکوتکە، (هەورا.) وەنەوزە کوتە، (شا.) ویژینگ، (هەورا.) چوورتم، خلماش.

**وەنەوشەیی:** ڕەنگی وەنەوشەیی، بنەفشەیی. (باک.) بنەفشین.

**وەنەی** (ژا.، هەورا.): خوێندن.

**وەند:** (کە.) ئازا، دلێر (بەخ.) زادە، زا، (نادر ــ: نادرزادە). (لو.، شو.) وەرز.

**وەندەی** (زەن.): چاندنی تۆو و نیدیکە، ڕەنگ.

**وەندیداد:** بەشێکە لە کتێبی پیرۆزی ئاوێستا.

**وەنگ** (کەل.): ڕەنگ، سیاوەنگ، ڕەنگ ڕەش.

**وەنن** (ڕۆژ.): خستن، بارەکەی وەن: بارەکەی خست.

**وەنی** (هەورا.): قەزوان، قەسکوان، (دەر.) قەسقووان، (باک.) وەکو، ئاوا، بەوچەشنە.

**وەنیە:** ئایا وەهانییە؟.

**وەوڵە:** گەمە، بووکەشووشە. ــ بارانێ: بووکە بە بارانێ.

**وەوی** (دەر.، جا.): بووک.

**وەە** (باک.): وەی، لە واقمانێدا بەکاردەبرێ.

**وەها:** وا، ئاوا، جورنەو: وها، بەوجورە، ڤەهە، ولۆ، هووسا، هوسا.

**وەهار** (کە.، هەورا.): بەهار.

**وەهاس:** وایە.

**وەهاست** (دەر.): وایە.

**وەهایە** (باک.): ڕەنگە، لەوانەیە.

**وەهلە** (کۆ.): هەل، چەل، جار، کەرەت.

**وەی:** ئەی، وەە، لەکاتی واقماندا، لەدەمی پەرێشانی و لێ قەومانێدا بەکار دەبرێ و لە ئێش و ئۆفدا، وای، ئەی، ئۆ، ئۆە، ئای، ئۆف، ئاخ. (هەورا.، کە.) زیان، بەڵا، رووشە، ترس، کارەسات، ئەو، ئەم. بەئەو، بەئەم، بێ ــ: بێ زیان، بێ ترس. (باک.) وەکو، وای.

**وەیداد:** ئای وای، هەیهاوار، ئەیداد، هەیداد، وەیهاوار.

**وەیدەر:** هاوار، زیان دەر.

**وەیرۆ:** ڕۆڕۆ، وەیشێرە، ئەیشێرە، ئەیرۆ، ئایرۆ، ئافرەتان لەکاتی تەنگانە و لێقەومانێدا وەکوو هاوار بەکاری دەبەن.

**وەیشەک** (باد.): بەور. (ڕەوا.) وشەک. دەعبایەکە ڕەنگی وەپڵنگی دەچی و بەقەدەر سەگێکی گەورەیە و کلکی کورتە.

**وەیشوومە:** (ڕۆژ.، کە.) فەرتەنەی سەرما و گەرما، لافاوی سەرما و گەرما، (هەورا.) ئەیشیرە، ئەیرۆ، وەیرۆ، ڕۆڕۆ.

**وەیم** (باک.): ناز، گۆبەند.

**وەیکردن** (هەورا.): بەخێوکردن.

**وەینەک** (باک.): سووک، هەرزە.

**وەیوای:** ئەیوای، وایوای.

**وەیوە** (هەورا.): بووک.

**وەی وەگەرێن:** بەڵاگەردان.

**وەیوول:** دارێکی کێوییە، وەکوو ئێسکی ڕەقە.

**وەیهاوار:** ئای وای، هەیهاوار، ئەیداد، وەیداد.

**وتار:** گوتار. ــ نووس: نووسەری گوتار.

**وتە:** وشە، قسە، گۆتە، ــی سووک: جنێو. ــی بێ مانا و پڕوپووچ: هەڵیت و پەڵیت، لۆترەوانی. ــ ر: گۆیندە، هۆنەر، کوتیار.

**ووتەی** (هەورا.): نوستن.

**وتەمز:** لەمڕاستیدا، تۆمەڵێ!

**وتن:** پەیڤ، (باک.) ئاخۆتن، کوتن، ڤتن، بێژتن، وێژتن، ویشتن، (فە.) وەتن، واتەی.

**وتوو:** (باک.) ئووتی، ئوتوو. ــ لێدەر: وتووچی. ــ چی: وتووکێش.

**وتیار:** کوتیار، گۆتیار.

**وجاخ** (زەن.): نەژاد، ڕەچەڵەک. ــی فلان شت وایە.

**وجز** (هەورا.): نی بێستان، بژار. ــ کەر: بژارچن.

**وجان:** ئاسوودەیی، حەسانەوە، پشوو، ڤەرک، هەناسەدان، (کۆ.) بێن. ــ دان: حەسانەوە. بێ ــ: یەک بینە، پەیدەرپەی، بێ پرانەوە.

**وچچە** (خۆ.): شەخەڵ، ئەو کەدە تازەیە، کە داران تازەی دەردەکەن.

**وچک** (باک.): تەنگووچک.

**وحە:** وەحە.

**ودم:** ــ دان: ڕێ پێدان، وودم، دەستوور، پایدۆستی.

**ودمدار:** ڕێ پێدراو.

**ودێران** (ڕۆژ.): هەڵگرتن.

**ور** (باک.): ئەوێ.

**ور:** حەپۆل، خەپۆل، مێش خۆر، گێژ، کاس، دەبەنگ، هێڕ، هوور، بەنگی، گێل، سەرسام، (باک.) تەبا.

**وراسەی** (هەورا.): دروومان.

**وراوە** (کە.): کەڵکەڵە.

**ورە** (بابا.): ئاریشەن، توانا، هێزی گوزارەیی، بێ ــ یی: ترسەنۆک. بێ ــ یە: ڕێی ناکەوێ.

**وررە:** (کۆ.) زریان، (جا.) هوورە. سەبوون، سەبینی، جوورە مێشوولەیەکی گەورەیە ووزە ووزنە. (ڕۆژ.) خووری و لۆکەی هەلاجی کراو.

**ورتە:** بۆڵە.

**ورتەورت:** دەمەکوتێ، بۆڵەبۆڵ.

**ورتکە:** وردە پارچەی نان، کوورتەل، (گەر.) چنک چنک، (شن.) چنک. (هەورا.) ڕیزەنان، چیچکە، چینچک، وردەی نانی و یا نی هەر چتێکی بێ، هوورکە.

**ورتکەومرتکە:** هوورک و موورک.

**وردکردن:** گەلفچاندن، گەرمشاندن، گەلفاندن، هراندن.

**ورچ:** هەرس، خرس، (لو.) هرس. (هەورا.) هەشە.

**ورد:** خاش، چرت، (باک.) فردەک، هوور، هوورد، پەراشی، هویرا، ــ بوونەوە: تێ ڕامان. ــ بوون: مردین. (باک.) گژمرنین. هەلاهەلابوون، قەرقچین، توورتووخین، چرتین، گەرمشین. ــ کردن: تووتووخاندن، فردەک کردن، چرت کردن، هەلاهەلاکردن، گژمراندن، خنگارکرن، فردکرن، ــ کراو: (ڕۆژ.) پەراش.

**وردە:** (باک.) خوردە، چکۆڵە، هوردە. ــی قەندی: خاکە، گچکە.

**وردەبەرد:** شرک، شوورژک، کیلتە.

**وردەکاری:** کاری ورد، دوا دەسکارییەکانی شتێک لەکاتی دروست کردنیدا.

**وردەڵە:** چکۆڵە، گچکە، بچووک.

**وردەناس:** خوردەناس.

**وردە ورەش** (هەورا.): وردەواڵەفرۆش.

**وردەوا:** باگر.

**وردەواڵە:** (باک.) خوردەمەنی، کەل و پەلی عەتاری.

**وردەواڵەفرۆش:** خوردەفرۆش، عەتتار. (هەورا.) وردە ورەش.

**وردبوون:** گەلفچین، گەلفین.

**وردبین:** خوردەبین، میکرۆسکۆپ، سەرنج دەر.

**وردبوونەوە:** بەوردی تێڕوانین، سەرنج دان.

**ورد و خاش:** ــ بوون: پەلسین، هەلاهەلابوون، پەرچڤین، کرمنشین، مرچقین، پەراش پەراش، هەلسین، ــ کردن: مرچقاندن، پەرچقاندن، هەلاهەلاکردن، کرمنشاندن، پەلساندن، هاڕین. ــ بوون: (باک.) پەڵشان.

**وردیلە:** گچکۆکە، چکۆڵە.

**ورژە:** ورشە. (هەورا.) بەردە تراویلکە، (موک.) ــ ی مانگەشەوێ، تریفە.

**ورسی** (دەر.): برسی.

**ورشە** (هەورا.): بەرد یا چتی دیی، کە لە دوورەوە وەکوو ئاو بترووسکێ، سەراب، بەردە تراوییلکە. (جا.) خشەی پۆشاکی تازە، گرشە، ترووسکە، ڕەنگی چتێکی تەڕوترووسکە و رنجە، برووکە، ورژە. ــ دار: ترووسکەدار. ــ دان: تروسکان، درەوشان، برووکان، برووکانەوە، ترووسکەی ئاور و ئاو و ئەستێران.

**ورشەدان:** بریسکانەوە.

**ورشەورش:** جریوەجریوی ئەستێران، تروسکەتروسک، گرشەگرش.

**ورشین** (خۆ.): جێگایەکە باگر بێ، باگر.

**ورشێن** (خۆ.): جێگای باگر. (دەر.) وەردەوا.

**ورک** (باک.): بەرچیغ و ئەوداره باریکانەن، کەلەسەر ئالوو داران دادەنرێن.

**ورک** (ڕەوا.، باک.، هەورا.): گرووو، چەنە، ڕق، مات. ــ گرتن: گرگرتن، بۆ مرۆ و ماڵاتان.

**ورگ:** خورگە، گەیە، گەدە. چیکڵدانەی وڵاخ و ماڵاتان، (باک.) نوورک، زگ، سک، گەدگ، توورەکە پیسایی نێوزگی وڵاخان.

**ورگە** (کە.): جنێوە، بە کەسێک دەڵێن ورگی زل بێ.

**ورگن:** گرزک، سکن، زگ زل، زگن، زکن، (هەورا.) بەرزگ.

**ورنج** (کە.): ورنجە، ورشەورش، ترووسکەترووسکی چتی ورد.

**وروره:** وڵوڵە.

**وروژان:** بروانە: تێ وروژان، تێ وروکان.

**وڕی:** گێژی، دەبەنگی، هێڕی، کاسی.

**وریا:** وشیار، زیرەک، بەکار، کارێن، بەسەلیقە، سەلیقەدار. شەهباز، ستیلە، قووت، سالۆز، زیخ، فێرس، چوست، چالاک، بەخۆوەرکیو، کارین، نکوول، زیرەک، وشیار، بژیر، (باک.) جەڕجەهە، نێوی پیاوییە. ــ بوونەوە: بەئاگاهاتنەوە. زۆر وریا: بلیمەت.

**وریایی:** ئاگاداری، ئامادەیی، شەهبازی. سەلیقە، زیرەکی.

**وریزان** (هەورا.): هەڵسان.

**وڕێنە:** ووڕێنە، هووڕێنە، لە خەو یا لە نەخۆشیدا قسەپەڕاندن، وەرینە، وتەی پڕوپووچ: قڕاقە.

**وزاق** (کە.): باز، خۆ ــ کردن: بازدان.

**وزاندن:** ــ ی مێش و هەنگ، (زەن.) گزاندن.

**وزە** (شا.، بابا.): تاقەت، هێز، بێ ــ: بێ هێز، ئەندازە.

**وزەشەڕە** (هەورا.): داخستن، خستنەخوارەوەی مرۆ و ماڵات و بەرد و ئی دیکە.

**وززە:** دەنگی مێش و ژەنگەسوورە، گززە، گیزە.

**وززەوزز:** فززەفرز، ڤززەڤرز، (دەر.) گرزەگرز، گیزەگیز، ــ ی زەرگەتە و ژەنگەسوورە. ــ کردن: ڤزین و مزین.

**وزوزە** (شا.): (کۆ.) قازی بازی، زمزمۆک.

**وژار** (دەر.): بژار (ئی بێستان).

**وژە** (کە.): وانە: ــ کوتنەوە: وانەگوتنەوە. ــ دەر: وانەگوتەوە. مامۆستا. ــ ی با: هاژەی زۆر سەختی با. بێ ــ: بێ وەشوەشە، بێدەنک.

**وژەر:** مامۆستا، مودەریس.

**وژەوژ:** هاژەهاژ.

**وژنگ** (جا.): چۆک، ئەژنۆ. کلاوی ئەژنۆ: کلاوەی سەری چۆکییە.

**وس:** بێدەنگ بە، وست. ــ بوون: بێدەنگ بوون، کپبوون. ــ کردن: بێدەنگ کردن، کپکردن، دەمکوت کردن.

**وست:** وس، دەمکوت کردن، بێپهەست، بێدەنگ. ــ بوون: کپبوون.

**وستەی** (هەورا.): خستن، کەمراندن.

**وستۆ** (هەورا.، کۆ.): بەرباد، سەرنخوون.

**وسووسوارە:** تیرەیەکە لە بڵباسانی بیتوێن.

**وش** (باک.): وەشە، بۆ ئاژۆتنی کەرانە.

**وشا:** مەمکێکە وشک بووبێ.

**وشاردەی** (هەورا.): کوشین.

**وشە، وتە:** دەعبایەکە لە تیرەی پڵنگییە، کلکی بستێک درێژە، کورەبەشە.

**وشتە:** دەنگێکە تاجیی (تانجی) ی پێ دەردەکرێ.

**وشتەوشت:** وڕەوڕ.

**وشتر:** هەشتر، ئاروا (هی مێیە) ئارڤانە (هی مێیە)، هێشتر، حێشتر، شووتوور، حوشتر.

وشتر

**وشترئالووک:** وشترخۆرە.

**وشترەوان:** هێشترڤان.

**وشترخۆرە:** وشترئالووک، حوشترئالیک. قاتۆل، قاتۆ.

**وشترخۆرکە**: گیایەکە وشتر دەیخوا و ڕەگەکەی زۆر شیرینە، کە وشک بوو دەبێتە دڕک.

وشترگا

**وشترگا**: زەرافە.

**وشترمرخ**: وشترمر، نەعامە.

**وشران**: گوشران.

**وشک**: هشک، (باد.) زوها، بۆ جلکانە. ـــ بوونی دڵۆپە و ئاو: چک بوون، چک کردن، وەستانی دڵۆپە، چکین. ـــ کردن: گەرمخاندن، بەیین. ـــ بوون: گەرمخین. وشک کردن، قەرادە. ئیشک، قرقۆک، هیشک، هشک، هەوشان، دین، زرا، زوها، دیم.

وشترمرغ

**وشکانی**: ئیشکانی.

**وشکاوس**: ئیشکاوس.

**وشکەبەند**: سەرمای وشکە، کە بیبەستێ، ئیشکەبەند، وشکەسرە.

**وشکەڕن**: ئیشکەڕن.

**وشکەساڵ**: ساڵی نەبار.

**وشکەسڕ**: سەرمای وشک، وشکەبەند.

**وشکەسی** (هەورا.): هەربەوشکی، تەماشای ئەو ژنە بەوشکەسی چوینی: چە کەڵکی هەیە هەر بە وشکی و لە دوورەوە تەماشاکردن. ـــ کردن: ڕێگا دروست کردن.

**وشکەوەرد**: (دەر.) ئیشکاوز.

**وشک کەرەوە**: کاغەزی مەرەکەب وشک کردنەوەی لە کاتی نووسیندا.

**وشک و برنگ**: سەخت، ڕەق، ڕژد، چکووس.*

**وشکی، وشکێتی**: (شکا.) ترس، ئیشکی. (باک.) تەرسی، تەسی. (شکا.) ترسی، هیشکی.

**وشی** (هەو.): هێشوو. (خا.) دەڵێ: گوڵەگەنم، یا گوڵەجۆ.

**وشیار**: هوشیار، هشیار، برێڤ. ـــ بە: ها، دەک، دەک دەک، نێوی پیاوییە، دەگەل. ـــ کردن: برێڤان. ـــ ی: هوشیارکردنەوە، شیت.

**وشی کەر** (هەو.): گوڵ هەڵگرەوە. (دەر.) هووش کەر.

**وشی چن**: گوڵچن.

**وشین**: کوشین، گوشین. (جەبا.) وەشاردن، ڕێک کوشین.

**وکووف**: ناوەوە.

**وڵ** (یەز.): هەتیو.

**وڵ** (هەورا.): گوون.

**وڵات**: کیشوەر، خاک، وەڵات، هێڵ، وڵگە، نیشتیمان، زێد، مەڵبەند. ـــ پەرست: نیشتیمان پەرست. ـــ گر: داگیرکردنی وڵات و نیشتیمان. ـــ گیری: کاری داگیرکردنی وڵاتان.

**وڵاخ**: واخ، ولس، وڵپ، پێڕۆ، دەوار، مالات، (کە.) ئۆلاخ، (باک.) بێ تلشا. ـــ ی بەرزە: چارەوا، چاروا، دەوار.

**وڵام**: وەڵام.

**ولاخدار**: کاروانچی، خەربەند.

**وڵاو**: (هەورا.) بڵاو، پەخش، پەرت. ـــ بوون: پەخش بوون، پەرت بوون، بڵاوبوون. ـــ کردن: پەخش کردن، پەرت کردن، بڵاوکردن.

**ولای** (فە.): سوونەوە، سووانەوە، سوونان.

**ولایین** (دەر.): تێکۆشین، هەوڵدان.

**وڵە** (کە.): مڵە. (هەورا.) کون. ـــ کردن: کون کردن.

**وڵەگولاوی** (هەورا.): گوڵی گولاوی.

**وڵتە** (کە.): گەرای ماسی.

**وڵس** (دزە.): مالات، ولاخ، (کە.) ئاژاڵ، بەمالات و ولاخان دەڵێن وڵست.

ولک

**وڵست** (دزە.): وڵس، مالات، ولاخ.

**ولک** (زەن.، کەل.): گەڵا، پەلکی درەخت.

**وڵک** (هەورا.): گورچیلە.

وڵک

**وڵکە** (هەورا.): قاو، (کە.) وەڵگە، خاک.

**وڵگ** (ڕۆژ.): گەڵا.

**وڵگە**: بڕوانە: وڵات.

**وڵمە** (جا.): گۆشتە ئەستوورەکەی قوونییە، کەلەسەری دادەنیشین. گلمە.

**ولۆ** (باک.): ئاوا، وەها.

**وڵووڵ**: تەمبەڵ، بێکار.

**ولوڵە** (موک.، کە.): وروڕە، (خۆ.) وروورە، ئەو وردە هێلکانەیە، کە لە نێو زگی باڵندەی مێدایە. هێلکەیەکە پێستەکەی ڕەق نەبووبێ. (ڕۆژ.) ولووڵە. (ڕۆژ.) وروڵە. هێلکەی توێکڵ ڕەق نەبووەوە.

**ولهم** (باک.): سەقر (باڵندە).

**ولێرە** (هەورا.): پۆڵکەگایانە.

**ولێن** (کە.): فەریکە، فریک، هەڵپرواندن. ئانوک.

**ولێتەولێت** (دەر.): ویزەویز.

**ون**: ـــ بوو: گوم بوو، نادیار، لەناوچوو، بزر، (باک.) بەرزە، وندا، هوەندا، گوم، پەنهان، بێسەر. ـــ بوون: پۆشران، داپۆشران، بزربوون، گوم بوون، شاررانەوە، پەنهان بوون، داوسیان. ـــ کردن: بزرکردن، گوم کردن، شاردنەوە، پەنهان کردن، پۆشین، داپۆشین.

**ونارا** (کەل.): بەرزکردن، دەرخستن، نیشاندان.

**ونادا**: پێشان دان، نیشاندان.

**ونەی** (هەورا.): خوورێندن.

**وندا** (باک.): ون، ـــ بوون. ون بوون ـــ کردن: ون کردن.

**ونریز**: بکوژ، پیاوکوژ.

**ونستن**: کوتن، کۆتن.

**ونی** (هەورا.): خوورێن، نادیاری. (موک.) گومی، بزری، شارراوەیی، پەنهان.

**ونیار**: وندا، نادیار، بزر.

**ووحە**: هووهە، بۆگێرانەوە و ڕاوەستاندنی ڕەشەوڵاخان بەکاردەبرێ.

**وودم**: پیرۆزی، ئیجازە.

**ووتار**: گوتار.

**ووتە**: ووشە، واتە.

**ووتەر:** بێژەر، بوێر.

**ووتەن:** نوست، نوستو.

**ووتەویرە:** ووتوویرە.

**ووتەی** (هەورا.): نوستن، خەوتن.

**ووتەی سەربەخۆ:** ووتەی ڕاستەوخۆ.

**ووتن:** گوتن.

**ووتنەوە:** تازەکردنەوە، دووبارەکردنەوە.

**ووت و ووریا** (سل.): زرنگ، هوشیار.

**ووتوو:** ئووتی، ئوتوو. ــ لێدان: ئوتووکردن.

**ووتووی کارەبایی:** ئووتیەک بە کارەبا کاربکا.

**ووتووێژ:** دەمەتەقێی دووکەسان، دەمەقرێ، گفتوگۆ.

**ووچان:** بێهن دان، حەسانەوە.

**وور** (ڕۆژ.): گێژ، تول، دەبەنگ. ــ بوون: گێژبوون.

**ووراتن** (ڕۆژ.): هەلاتن، بۆ هەوێر و.. ئیدی.

**وورازین:** دوورینەوە.

**ووراق** (ڕۆژ.): کابرای درێژ و وراق: کابرای درێژ و وشک و لاواز، فراوان و گەورە: خانووی ووراق: خانووی گەورە و کەم خەڵک و بێ سامان.

**ووڕاوە:** ووڕێنە.

**وورە:** برسێتی، بڕوون. (ڕۆژ.) هێزی دڵ و هومێد. (ڕۆژ.) دەنگ، لەپشت دیوارەوە. بڕۆن، زەهلە. بێ ــ یە: بێ عەزم و مەعنەویاتە. (دزە.) مڵە، جۆبرکە.

**وورە:** چەنەبازی، وڕێنە. (کە.، ڕۆژ.) ئەو خوری یا لۆکەیەیە، کە هەللاج بە زەبری کوتک و ژێ و کەوان شی دەکاتەوە. (دەر.) بەرە.

**وورەتەی** (هەورا.): فرۆشتی.

**وورەوڕ:** (هەورا.) قوماریکە دووای وەی، کە هەموو لایەک بردیانەوە دیسانیش بیکەنەوە تا ئەو کەسەی، کە دەیباتەوە دەرکەوێ. گڤەگڤی بایە. بەردی پان باوێژرێ ــ ی دێ.

**ووربە** (ڕۆژ.): پاڵتۆ.

**وورتە:** پرتە، قسەی بن لێوان.

**وورچ:** هورچ، حورچ، خرس.

**وورد:** هوورد، هوێر.

**ووردە:** هوردە، خوردە.

**ووردەبەرد:** (باک.) خیچک.

**ووردەکار:** مرۆی ڕێکوپێک و بەتوانا، دەست ڕەنگین. *

**ووردەگیر:** ڕەخنەگر.

**ووردەڵە:** بڕوانە: ووردەڵە.

**ووردەفرۆش:** وردەواڵەفرۆش. خوردەفرۆش.

**ووردەواڵە:** هووردەواڵە، هووردەوات، شتومەکی فرۆشتنی عەتاران. ــ فرۆش: عەتار. خوردەچی، خوردەفرۆش.

**ووردەواڵەفرۆش:** ووردەفرۆش.

**ووردە ووردە:** پلەپلە.

**ووردبوونەوە:** سەرنج دان، ووردی، تێڕامان.

**ووردبین:** تۆژینەوە. پشکنەر.

**ووردبینی سادە:** میکرۆسکۆپی سادە. ــ ناسادە: میکرۆسکۆپی ناسادە.

**ووردکە:** وورتکە.

**ووردکەرەوە:** پۆلکەرەوە، سەرنجدەر. *

**ووردیکلانە:** ووردی کڵاّ. *

**ووردیلانە:** هوردیلاتە. *

**ووردیلە:** هوردیلە، وورتکە. *

**وورزە** (هەورا.): هەستە.

**وورزنەی** (هەورا.): هەستان.

**وورستەی** (هەورا.): هەستان.

**وورسی:** (فە.) وورسک، برسی.

**وورشە:** بەردە تراویلکە.

**وورک** (ڕۆژ.): ڕک، بیانوو. ــ گرتن: ڕق هەستان، بەهانەگرتن.

**وورکە:** (کورک.) زێ، چۆمی گەورە.

**وورکەنن** (ڕۆژ.): هەڵکەندن.

**وورکێفتەی:** (هەورا.) هەڵکەندن. (فە.) هەڵکەنین.

**وورگ:** گورگ، کرش.

**وورمە نێزە** (ڕۆژ.): هەلمستە.

**وورمێ:** ماوەدان، ڕێپێدان، ئیجازەدان.

**وورنای** (هەورا.): خوراندن.

**وورکێفتەی:** (هەورا.) هەڵکەندن. (فە.) هەڵکەنین.

**وور وەزنەی** (هەورا.): خۆ هەڵاوەسین.

**وورووە:** چەنەباز. (موک.) وڵووڵە.. هی مریشک.

**وورووژاندن:** هورووژاندن، تووڕەکردن و شڵەژاندن. *

**ووڕی:** هێڕی.

**ووریا:** بەئاگا. ووریایی: بەئاگابوون، ژیر.

**ووریاندن** (هەورا.): خوراندن، کڕاندن.

**ووریای** (هەورا.): خوران.

**ووریایی:** ووشیاری.

**ووریزان** (ڕۆژ.): هەستان.

**ووریزان** (ڕۆژ.): هەستان لە خەو و دانیشتندا.

**ووریزنای** (هەورا.): هەستاندن.

**ووڕین:** بڕین. (هەورا.) ڕوخانی دیوار و کێو کەنداڵ. (فە.) بڕین.

**وورینگ:** ماوە، دەرەتان.

**ووریشە:** ورشە.

**ووریشن:** گرشەدار، وورشەدار. *

**ووڕێنە** (ڕۆژ.): لە خەویدا ئاخافتن. وڕێنە، قراقە.

**ووزاق:** دەرپەڕینی بە تەووژم، فڕێدان. *

**ووزای:** خستن.

**ووزه** (ڕۆژ.) توانایی. (شا.) قەڵاپەستە، چەند کەسێک یا چەند چتێک بەسەر یەکدا بکەون. ـــ ی گەرمی. ـــ ی خۆر. ـــ ی کارەبا. ـــ ی ئەتۆمانە.

**ووزاره:** بیر، ئەندێشە.

**ووزاردن:** بژاردن.

**ووزانه:** بژاردە.

**ووزانندن:** هەڵبژاردن.

**ووزانن:** هەڵبژاردن، بژاندن.

**ووژه** (فە.): بست.

**ووژانه** (ڕۆژ.): بژاردە، هەڵبژاردە، بژارەکردن، بۆ مێوژ و ئیدیکە دەبێت.
ـــ کردن: هەڵبژاردن، بژاردن. ـــ کەر: بژارکەر.

**ووژه** (ڕۆژ.): دەنگەدەنگ، ئەوەندە زۆر بوون ووژەیان هات.

**ووژێنه** (ڕۆژ.): هەڵبژاردن.

**ووژنگ:** ئەژنۆ.

**ووس:** بێدەنگ بە، وسکت بە، بێ دەنگ، بێ دەنگ بە. ـــ بوون: وست بوو.

**ووسا:** وەستا، مامۆستا.

**ووسای** (هەورا.): نوواندن.

**ووستەی** (هەورا.): نووستن، بنوو.

**ووستن:** بڕوانە: خستن. ـــ کردن: خۆش، جۆش.

**ووسنای** (هەورا.): نوواندن.

**ووش:** بۆ ڕاوەستانی کەر و ئێستری بەکار دەبرێ، وژش، هۆش، چۆش، چۆش، هۆش. گوشین.

**ووشان:** ووشین، هەڵچۆڕان.

**ووشاندن:** کیڤەکون، کیڤاندن.

**ووشه:** ووتە، وتە. ـــ بەزاری کوتن: ئاخۆتن.

**ووششه:** کیفە، دەنگی ماری لەکاتی شەڕێدا. ـــ کردن: ووشاندن، کیفاندن، شۆر.

**ووشەک** (ڕەوا.): بەور، (جانەوەرێکە)، کوڕەبەشە.

**ووشەوش:** ووژەوژ.*

**ووشەووش:** کیفەکیفی ماری.

**ووشەی ساده:** ووتەی سادە. ـــ ی لێکدراو: ووتەی لێکدراو.

**ووشت** (خۆ.، دزە.): ـــ بوون: زراوچوون. ـــ کران: ترسێنران.

**ووشتر:** بڕوانە: وشتر.

**ووشتراو:** شەپۆل.

**ووشتره:** شەپۆل.

**وشترەوان:** (باک.) سیوانەک.

**ووشترخۆره:** جانەوەرێکی دڕندەیە لە تیرەی پشیلەکێوییە و دەڵێن خۆ دەخاتە سەر پشتی ووشتر دوگەی دەخوا.*

**ووشترمر:** وشترمرغ، نەعامە.

**ووشک:** ئیشک. ـــ کردن: (باک.) پەیین.

**ووشکان:** جێگەی بێ ئاو، بەژ، زەوی بەژک.

**ووشکاندنەوه** (ڕۆژ.): پشکاوتنەوەی خوری لباد و پەتک.

**ووشکانن** (فە.): پشکنین.

**ووشکانی:** بەژ، زەوی بەژک.

**ووشکاوی:** ئەو گیانلەبەرانەی لە ووشکانیشدا دەژین و لە ناو ئاویشدا.

**ووشکه** (ڕۆژ.): نەخۆشییەکی ئاژاڵانە تووکەکەی دەوەرێنێ. پارەی بەدەستی دراو.

**ووشکەڕن** (ڕۆژ.): ڕنینەوەی پێستی مەڕ و بزن بە مردوویی. بە ووشکی گیا ڕنینەوە.

**ووشکەکەن** (کرما.): بڕوانە: ووشکەڕن.

**ووشکەساڵ:** ساڵی ئەبار، ساڵی ئەهات.

**ووشکەڵ:** لک و پۆپی وشکی دارانی شینە.

**ووشک کەرەوه:** مژۆک، قاقەزێکە نووسراوی تەڕی پێ وشک دەکرێتەوە.

**ووشک کردنەوه:** هیشک کردنەوە. تەڕایەتی تێدا نەهێشتن.

**ووشک هەڵاتن:** وشک بوون، زۆر لاوازبوون.

**ووشکی:** هیشکی، هیشکاتی.

**ووشی** (خۆ.): هێشوو.

**ووشیار:** بڕوانە: هۆشیار.

**ووشین** (کە.): گوشین، هەڵچۆڕانن، چکەبوونی ئاوی باراناو، دڵۆپە.

**ووشیان:** کارکردن.

**ووفه** (ڕۆژ.): برینێکە لە لاقی ولاخی پەیدا دەبێ وەکو شووقاق پێستەکەی تێکدەدا.

**وول:** خونچە.

**ووڵات:** بڕوانە: وڵات.

**ووڵاخ:** بە کەرو ئێستر و ئەسپ و ماینی دەڵێن، ووڵاغ. ڕەشە ووڵاخ: بە گا ومانگا و نینگوێن و ڕەچەڵەکانیان دەڵێن.

**ووڵاخبەرزه:** ئەسپ و ماین و ئێسترە.

**ووڵام:** وەڵام.

**ووڵاغ:** ووڵاخ.

**ووڵاو** (هەورا.، ڕۆژ.): بڵاو، ـــ ووڵاوە: بڵاو، پەخش. ـــ کردن: پەخش کردن. ـــ کردنەوە: بڵاوکردنەوە.

**ووڵه** (ڕۆژ.): وڵوڵە.

**ووڵه و لووتێ** (هەورا.): تفنگ، کونەلووت.

**ووڵحێ:** گێل.

**ووڵک** (ڕۆژ.): گورچیلە.

**وولۆشه** (هەورا.) بڕوێش.

**وولێره** (هەو.): (هەو.) گالۆز، دەنکی لە نیسک گەورەترە و لە نۆکی بچووکترە.

**وون:** بزر، گوم. خوویّن. ــ بوون: هویلیان، ئاوابوون. ــ بوو: بزر، لـەناو چوو. ــ کردن: هویللانن.

**وونارن** (هەورا.): لـە داغ و پەرژشان هەردوو دەستان تێکخستن.

**ووناری** (هەورا.): ڕاگرتن.

**وونەی:** خوێندن.

**وولۆ:** گوڵبێنەی تەندوور.*

**وولی** (هەورا.): گوڵ، بۆ تاک و کۆ دەبێ.

**وولێقە** (هەورا.): بڕوانە: وولێوه.

**وولێوه** (هەورا.): گوڵێک، تاقەگوڵێک.

وولێوه

**ووناری** (هەورا.): ڕاگرتن.

**وونی:** بزری، وون، (هەورا.) خوویّن.

**وها** (باک.): هەروەها، ئاوا، وەها.

**وهارەکێنی** (دەر.): بەهارەکانی.

**وێ** (باک.): (بـاک.) ڤـێ، لـە ئـەو وەرگیراوە، بـۆ مێیانـە، هـی. ئـەوێ، جێگایەکە لـە نێوانی دووکەساندا دیار کرابێ. (زا.) وا، وەکو. ــ لـە دەرێیە: وا لـە دەرێ. (ژا.) ئەو (کە ژن بێت). هی، پێ، ــ ی هەیە، پێی هەیە، واتە: هەیەتی. (هەورا.) خۆ، وێم: خۆم. وێمان: خۆمان. وێت: خۆت، وێتا: خۆتان. وێش: خۆی. وێشا: خۆیان.

**ویاران:** تێپەڕین، ڕابردن، گوزەرکردن، ڕەت بوون.

**ویەرد** (هەورا.): تێپەڕیو.

**ویەردە** (هەورا.): ڕابردوو.

**ویەردەی:** (لـو.) لێگەڕان، وازلێهێنان. (هەورا.، کـەل.): تێپـەڕین، ڕابردن، ڕەدکردن، ڕەت بوون، بەلیاندن. (هەورا.) ڕابردن، تێپەڕین.

**ویەرنای** (هەورا.): تێپەڕاندن. بەخشین.

**وێتا، وێتان** (هەورا.): خۆتان.

**ویتەویت:** ــ ی چۆلەکە و باڵندانە. (دەر.) ولیتەولیت.

**وێتداچێ** (ڕەوا.): نۆشی گیانت بێ.

**وێتن، هۆتن** (ڕۆژ.): نوستن.

**وێجا** (هەر.): ئەودەمی.

**وێجنه** (هەورا.): بێژنگ.

**وێچوو:** لێکردوو، هامپا، هـەمپا، هاوتا. (بـاک.) بەربـەهـڤ، لێچـوو، هەڤرات، ئاسا، وەکوو.

**وێچوواندن:** لێچوواندن، شوبهاندن.* (بـاک.) بەرهـەڤدان، تۆفکـردن، لێچوواندن.

**وێچوون:** لێچوون، لێکـردن، تزبوور، هـەڤراتی، (هـەورا. کۆن) ئـەرەجێ، تۆف بوون، وێدەچێ، ڕەنگە، گومان دەکرێ.

**وێخستن:** پێداکردن، پێدا هەڵاوەسین، پێوەخستن. داخستن.

**وێدە:** بدە.

**وێدەچێ:** هەیپایە، شاید دەبێ.

**ویر** (هەورا.): بیر. (زەن.، لو.) بیر، یاد، هۆش. بێ ــ: بێ بیر. ــ دار: بیرچاک.*

**ویڕ:** واتا، ناوەرۆک، لێکدانەوە.

**وێڕا** (موک.): لـەگەڵ.

**وێران:** کـاول، کـاڤل، کـەمباخ، کامباخ. ــ بـوون: کـاول بـوون، هـەرفتن، هەرفین، تووانین، وێرین. پێ ــ: توانین، داخان، زەبەر، شکێر، پەکان، پتیوار، تارومـار، کـاول. (هەورا.، ڕەوا.) خاپوور، خرتـک. (هــەورا.، شن.) خشتوور. ــ بوون: پتیواربوون. ــ بوون: ڕووخـان، قیـران، تێـک و پەکان بوون، تێکدران، کاول بوون، هەرفاندن، ڕمین، ڕمان، هەڵوەشاندن، تێکدان، کـاول کردن، پتیوارکردن، هـەرفاندن، خاپوورکردن، ڕووخـاندن، زەبەرکردن، قیراندن.

**وێرانە:** کاولگە، کاول.

**وێرانکەر:** ڕووخێنەر.

**وێرانکەردەی** (هەورا.): وێرانکردن.

**وێراهاتن:** پێداهاتن، بەڵەدبوون، فێربوون.

**ویره** (موک.): دەنگێکە بە وورتە وورت، دەنگی نزم بە دەم بۆڵەبۆڵەوە.
بە ــ: بەوورتە وورت.

**ویرە، ویرەویر:** دەنگی گریانی نـەرمی منداڵان، ویرەی یـەک لـە دوای یەک.*

**وێرەکە:** بڕوانە: وێرەگا.

**وێرەگا** (هەورا.): نێواری.

**وێرت** (باک.): وەرت، (ئەردە.) جێ نشین، جێگر، منداڵ.

**وێروه** (هەر.): بەولاوە. (باد.) هێڤه.

**وێرێ** (باد.): ئەوێ.

**وێرین** (باک.): بوێر، توانین، وێران.

**وێزار:** بێزار، بەدبەخت.

**وێزان:** توانین، توانایی.

**ویـزه:** دەنگێکی باریکـە، گیزه، گیڤـە. ــ ی گوولـلـەهاتن. گیزه، ویتـه، ولیتە.

**وێزه** (کە.، بابا.): زگ، گیان. هاتە ــ ی: هاتەگیانی.

**وێزەگ:** چەگەنێکی پاک کراو و بێ گەڵایە، بۆ حسیری باشە.

**وێزەنگی** (هەورا.): ئاوزەنگی.

**ویزەویز:** دەنگی زۆر باریکە، دەنگی چەشنە باڵندەیەکی چکۆڵەیە لـە نێـو دەغڵ و گیایاندا. ولیتەولیت، ویتەویت، گیزەگیز.

**ویزین** (باک.): ڤزین، وززەوزز.

**وێزەیی:** هەڵکەوت، کەم.*

**وێژ:** مۆرفیمێکی بەندە، گێژ و وێژ.*

**وێژامە:** وەژەگ، نڤیسکی، پەخشان.

**وێژامەر** (کورد.): بۆسەی جۆتی.

**وێژامور** (خۆ.): زەنگوڵە.

ویژامورر

**وێژان** (کە.، دەر.): دابێژان، بێژان، لـە بێژینگ دان.

**وێژاندن** (کە.، دەر.): دابێژتن.

**وێژه** (کە.): ئەدەب، بێژه، گۆتە، باوێشک.* ــ کردن: سیرمە: هیرتە. (کە.) چەند سیرمـەیەکی پێکەوە بادراوە بۆ بەستنی ڤژانە، هیرتە.

**وێژەدار:** وێژەوان.*

**وێژەر:** بێژەر، قسەکەر.*

**وێژەن** (هەورا.): بنیشت، بنێشت، جاجک.

**وێژەوان:** نووسەری هۆنراوە و پەخشان.*

**وێژەی تەماشا:** وێژەی شانۆ.*

**وێژەی چیرۆک:** ئەدەبی چیرۆک.*

**وێژەی دووان:** ئەدەبی دوران (خیتابی).*

**وێژەی مرمرین:** وێژەی نواندن.*

**وێژەیی:** خۆررووی. (کە.) خۆرروویی، سەر بە هۆنراوە و پەخشان.*

**وێژتن:** گوتن.

**وێژکین:** دارشتن.

**وێژنە:** قسەکەر.

**وێژنگ** (دەر.): بێژینگ.

**وێژنگ:** بڕوانە: وێژینگ.

**وێژیاگ:** قسە، گوتە.

**وێژین:** کوتن، گوتن، ووتن.*

**وێساگ:** وەستاو، هێمن.

**ویس** (هەورا.): بیست ۲۰.

**وێسا:** ئێستا، ڕاوەستا.

**وێسان** (دەل.): وێستان، ڕاوەستان، ڤیسان.

**وێسە:** وەستان، هەڵوێستە.

**ویست** (هەورا.): دڵخواز، ئارەزوو. ـــ ی دڵ: دڵخواز. پیست.

**ویستا:** بڕوانە: وێسا.

**وێستا:** ئێستا، هەنووکە.

**ویستان** (کە.): ڕاوەستان. ـــ دن: ڕاوەستاندن.

**وێستاو:** ڕاوەستاو، لەکار وەستاو.

**ویستەر:** بخواز، خوازۆک، خواستەر.

**ویستەمەنی:** پێویستی.*

**ویستەمەنیەکان:** پێویستێکان.*

**ویستراو:** داخوازراو.*

**وێستگا:** ئیستگا.

**ویستن:** خواستن، ئارەزوو، ڤیان، ڤین، وایستن. (دەر.) دیتن. هێزی ویستن: خوەی ڤین. نە ـــ: نەخواستن.*

**ویستنامە:** پەلاتە.

**وێش** (هەورا.): خۆی.

**وێشە** (هەورا.): مێشە، خۆیەتی.

**وێشتن:** کوتن.

**ویشتن** (گۆ.): کوتن، گۆتن.

**ویشک:** ووشک، هیشک.

**ویشی** (دەر.): وەکوو، دەڵێی.

**وێڤە** (باک.): واوە، ئەملا، بوێڤە، بۆ دەرەوە؛ هەرە: واوە بڕۆ.

**ویقە** (کە.): قیژە. ـــ ویق (کە.): قیژەقیژ.

**ویقەویق** (هەورا.): دەنگی منداڵێکە تازە بووبێ، واقەواق.

**وێکەوتن:** پێکەتن، لێکەوتن، مەنەکردن، پێکەوتن، بەدی هێنان. ساف لێدان: لێکۆڵینەوە.

**وێکچوو:** (باک.) جیوک، جیویی، لەیەک چوو، چون یەک بوون.

**وێکچوواندن:** پێکچواندن. خەوخاندن.

**وێکچوون:** پێکچوون، لێک کردن. ناڤداش، ناڤلهەڤ.

**وێکخەر:** هۆکەر.

**وێکخستن:** پێک هاتن.

**وێکرا:** پێکەوە، بەیەکەوە، تێکرا.

**وێک کەوتن:** بەیەک گەیشتن، (باک.) پەڤ کەتن. ـــ ەوە: وێک هاتنەوە.

**وێک گەیاندن:** بەیەک گەیاندن.

**وێک گەیشتنەوە:** بەیەک گەیشتنەوە.*

**ویکۆڵ** (هەورا.): دارەبی.

**وێک هاتن:** ڕێکهاتن، (باک.) پرنسین. ـــ ەوە: داهاتنەوە، هاتنەیەک، وێک هاتنەوە، هاتنەوەیەک.

**وێکهاتنەوەی زاری برینان:** سارێژبوونی برینان.*

**وێک هێنان:** گەیاندنە یەکتری، پێک گەیاندن. (باک.) گهاندنە هەڤ. (کە.) پاتەکردن. خوـ: کرووژم هەڵاتن، خۆکرووژم هەلیان، پەلکین.

**ویگاندن** (کە.): وەدەنگ هێنان، قیراندن، واقەواق کردن.

**وێڵ:** ئاوارە، سەرگەردان. (کە.) وێڵ بوون. گومڕا، ڕێ بزر کردوو، ـــ کردن: ڕێ لێ بزرکردن.

**ویلان** (فە.): هاوارکردن، قیژاندن.

**وێلک** (بابا.): بەژن و قەدی دارانە تا لکەکان، قەدی دارانە.

**وێلوو:** دارێکی کێوی وەک ئێسکی ڕەقە جوورە گەڵایەک و بەرووێکی دێنی، جوورە دارێکی دیکە لەبەتوپ لە نێو لکەکان دەردەکات وە خوێ ناچی، وە ئاڵووباڵووی دەچی بەرێکی دێنی دەبێتە نەموکانە.

**وێلی** (کە.): ئاوارەیی، سەرگەردانی.

**وێلی وێلی** (هەو.): گەمەیەکە.

**وێم** (هەورا.): خۆم، دڵ، ـــ (ناز). (هەورا.) ـــ ان: خۆمان.

**ویم** (زەن.، کۆن.): خۆم. جەبنج کەند ویم: لەمریشە هەڵکەنراو خۆم.

**وینا:** بینا. ـــ یی: بینایی.*

**وێناهی:** لێکچوون، وەکوو.*

**ویناى** (هەورا.): دیتن.

**وێنە:** نیگار*، چەشن، درووڤ، سەربەر*. ـــ ی چێتێکی نواندن: پیشاندانی وێنەی شتێک*. ـــ پێو: وێنەی ئەندازەکێش. ـــ گر: وێنەکێش. ـــ گرتن: وێنەکێشان*. ـــ گری: وێنەکێشی*. ـــ ی ڕاستەقینە: وێنەی ڕاست*. ـــ ی بەرز: نموونەی باڵا*.

**وێنەچوو:** سەراسا، لەسەرووی ئاساییەوە.*

**وێنجە:** (باد.) ئونجە، بەکوتراوی لە هەر برینێکی بنرێ دەیبرژێنێتەوە. ـــ کێویلە: (باد.) کەتی.

**وێنەرێ:** ئەوێ، وێ، ئەوێندەرێ. (باد.) لایێ هێ. لە ـــ: لەلایێ هێ.

**وینک و پا** (باد.): باداری، ڕژماتیزم.

**ویی:** (موک.) بەئەوەیی. بەویی: (باک.) دا، ڤی. هەمورمان دابەویی: مەمەر تشت دایەوا. ئای، وای ـــ: لە ئێش و ـــ وی، وا، واه. (زاخ.) هو، ئەو، کە پیاو بێ، وەی. (باک.) لە ئەو وەرگیراوە (بۆ نێرانە). دارەبی.

# ه

**ه:** تیپێکی ئابێی کوردییە. بەڵێ، حا، پیاح، پیا، ئەها، بۆ واق ووڕمانە. (موک.) ئاها، هاها، هەڵا، پەح، پەحا، تەح، تەحا، هەها.

**ها** (هەورا.): وا، هەیە، هانە پای ئەوکۆ ڕەندان چون پەری: وا لە پاڵ ئەو کێوە جوانی وەک پەری هەیە. (باک.) ها، ئەوەتا، هۆوەتانێ، هانێ ئەوەتا بگرە، ئەواهاتم: ها ئەمز هاتم. کە چتێکت وەبیر هاتەوە دەڵێن: هاها. ـــ بگرە: (باک.) وا، ئەوا، ها لە وێیە، والەوێیە، ئاگاداربە، دەک دەک، وشیاربە، بۆ هەڕەشەیە. (کەڵ.) هەیە، هەس. (باک.) ئەوێها: ئەو. تەدایە هاڤێ، هالچونگی، هالناڤێ: تۆ چوویە نێو ئاوێ و تەیدی ناکا، کە تۆلە نێویدا تا ئەمژنۆ بێ یا تا پشتێندت. (کە.) بەڵێ. (موک.) بگرە، ئەوەتانێ. ـــ بە: ئاگاداربە. ـــ کردن: ئاگادار کردن.

**هاء:** نەء، ناء، هەء. ها ژخوە هەبوون (باد.): ئاگا لە خۆبوون، ئاگاداری.

**هاپۆ** (شە.، ڕژ.): مام، ئاپۆ.

**هاپۆزا** (شە.، ڕژ.): ئامۆزا.

**هاپۆژن** (شە.، ڕژ.): ئامۆژن، مامۆژن.

**هات:** لە (هاتن) موە بۆ یەکێکی نەدیوە. خۆشبەختی، بەختیاری. ـــ ی کشتوکاڵ: باش بوون و زۆر برین. زۆری بەرهەم هێنانی کشت و کاڵ.

**هاتەهات:** چاوەڕاو، ـــ ی نەچیر و دز و لەشکر و ئیدیکەیە.

**هاتەدەست:** لەهەڤ کەتن، بەدەست هێنان.

**هات هات** (هەو.): بۆ هەڵفڕاندنی باڵندانە.

**هاتن:** ئامای. ـــ ەبا: (باک.) هاتن با. تەگەیەتی: (باک.) هاتن بەران (بۆ مەڕی). بەتەگەیە: (باک.) هاتن نێری (بۆ بزن.). پێدا ـــ: بەسەردا ـــ، وەرە. ـــ ەکوشتن، ـــ ە دەر، ـــ موەیەک: هاتن هەڤ. وەبەزەیی ـــ . ـــ ە سەرخۆ: بەربەهەڤ ـــ: وەخۆکەوتن: پەرژان. لێ ـــ. باران لە تێ: باران دەکەوێتە سەرمان. لێ وەشانەوە، سەر سوورمان، پەوک و باندەڤ لەهات. سەر خوەڤە ـــ: وەخۆ هاتنەوە، پەشیمان بوونەوە. ڕاست ـــ: ڕێک کەوتن، بەئەنجام گەیشتن.

**هاتنەپا:** بەپابوون (بۆ سەگ و پشیلە).

**هاتنەبوون:** بەدی هاتن، ڕێکی، ڕاستی، ڕێک و پێکی بناغەی چتی. *

**هاتنەبەر:** وەبەرهاتن، بەکەڵ بوون.

**هاتنەخووار:** کیژین، وەربوون، پەیابوون، (باک.) داهاتن، داچوون، ڤەهاتن، سەرەوژێربوون، داگەزران.

**هاتنەدەر:** دەرکەوتن، وەدەرکەوتن، دەرهاتن.

**هاتنەدی:** وەدی هاتن، وەڕاست گەڕان.

**هاتنەدین:** ڕاست هاتن، ڕێککەوتن، بەئەنجام گەیشتن. *

**هاتنەدیل:** بڕوانە: هاتنەدین. *

**هاتنەڕێگە:** هاتنەڕێ، هاتنەبار. *

**هاتنەژێردەست:** خستنەبەردەست. *

**هاتنەسەرخۆ:** بووژانەوە. ووشیاربوونەوە. *

**هاتنەکردن:** ئەنجام دان، شیاوی کردن. *

**هاتنەکوژتن:** کوژران. *

هاتنەکوژتن

**هاتنەوە:** گەڕانەوەجێگای خۆی، ئامانەوە. ـــ سەرخۆ.

**هاتنەوەیەک:** ڕێک هاتنەوە.

**هاتنەیەک:** ڕێک هاتنەوە.

**هاتن و چوون:** سەفەرکردن، ئامشۆکردن، هاتوچوون *

**هاتوو:** هاتیار.

**هاتووچۆ:** ئامەشۆ، هاموشۆ. (زا.) ئالموشۆ. کەین و بەین، بینە و ببەستە، دەردەسەری. ـــ کردن: ئامان و شیان.

**هاتوون:** ئامێنێ، هاتن (بۆ گەلە).

**هات و نەهات:** مان و نەمان، سەرکەوتن و ژێرکەوتن، قازانج و زەرەر، ڕێ ی ـــ: ڕێگای مان و نەمانی (تەلەزگە و بقەیە).

**هات و هاوار:** وەلام و دەنگوباسی ناخۆش، هەراهەرا، داد و بێداد، بانگ و فەریاد لە گەڕانەوەدا.

**هاتیار** (کە.): هاتوو.

**هاتیکە** (هەورا.): سەیدووکە.

**هاتی هەڤ** (باک.): هاتنەیەک، ڕێک هاتن، ڕێک گەیشتن.

**هاجری** (باک.): خراپ، زەرەردار.

**هاج و واج:** گێژ و وێژ. *

**هاجی ڕەشک** (باک.): پەرەسلێرکە.

**هاچە** (موک.): کوڵەکەی دوولک، دووفلیقانە، دووگوێ، دووگێ.

**هاچۆ** (زا.): قاشۆ، چەوگانی گۆیێنێ.

**هار:** شێتێکە زیاندەرێ، بۆ سەگ و گورگ پتر بەکاردەبرێ. بەرق هاندراو. ـــ بوون، ـــ کرەز.

**هاڕ** (ڕژ.، کە.): بەرداشێکە خراپێتە تەوق.

**هاڕسیو** (جا.، هەورا.): بەرداش.

**هاڕان:** هێڕان، هاڕین، گژمرین، مرچقین، مخمخین. ـــ دن: بەدەنگی بڵند گوڕاندن، ـــ ی مرۆ و تاوە.

**هاڕیو:** لەئاش کراو، وردکراو، (ڕژ.) پەڕاش.

**هاڕە** (هەورا.): بەرداش، دەستاڕ.

**هاڕە ئاسیاو** (هەورا.): بەرداش.

**هاڕەهاڕ:** گوڕەگوڕ.

**هاڕڕه:** گوڕڕه. ــ ی فرۆکه. ــ ی هەیاسه و کەمبەره.

**هارەنیه** (هەورا.): تەلاشبەرد.

**هاڕەی دەستی:** دەستاڕ.

**هارت و هورت:** هات و هوت، شانازی کردن. *

**هارد:** ئارد.

**هاردڕاو:** هارڕاو. *

**هارزنگ** (جا.): گیایەکی بەرز و جوانه وەکوو سەوڵ وایه.

**هارس** (باک.): سووچ، تاوان.

**هارسم** (باک.): ترێی سەوز.

**هاروو** (هەو.، بار.، خۆ.): هارویّ، خەیار. (هەورا.) پووک، خلێنه.

**هاروونی:** تیرەیەکه لە جافان. (بەردی چکۆڵه).

**هار و هاچ:** بێ ئابڕوو، قۆشمه.

**هارویّ:** خەیار. (هەو.، بار.، خۆ.) هاروو، (دەر.) ئاروو. (هەورا.) پووک. ــ ی تازه: جەهیک.

**هاری** (کە.): زۆر شینی، گەویی، یارمەتی، هاریکاری، بڕوانە: یارمەتی.

**هاڕیاگ** (هەورا.): هاڕدراو.

**هارێتی:** شێت و وێتی. *

**هاریکار:** ئاریکار، هاوکار. *

**هاڕین:** هێڕین، گزمراندن، مخمخاندن، قەرمچاندن، گەرمشاندن، وردکردن، داهاڕین، پەلساندن، ئاڕین، ورد و خاشکردن، مرچقاندن، رجرجاندن. (دەر.) هەڕین. (باک.) پەرچقاندن، هێرتن، خنگارکرن. ــ ی گەنم: لێکردن.

**هاڕینەوه:** قرچشکێن کردن.

**هاز:** کاردوو. (کە.، دزه.) گیایەکە گەڵای درێژه وه گوێی بزنیّ دەچی، بنەکەی خڕ و چکۆڵەیە وه دەنکی هەناری دەچی بنەکەی دەکرێتە چێشت و دەخوریّ. ئەو گیایە لە وڵاتی دزەییاندا وشکی دەکەنەوە بەهار لەبری سلق بەکاردەبریّ. (ڕۆژ.) کاردوو. (قەره.) گیایەکە سیّ جووره: ١) گەڵای پانه پێی دەڵێن هازەمارانه. ٢) هاز، لوولکە کاردوو. ٣) هازسەگانه نێرتکێکی لە ناو دەردەچیّ لە دووای گەڵاوێژیّ. (کە.) هێز، تاقەت. وه ــ: بەهێز، ــ دار: بەهێز.

**هازی** (هەورا.): تاقەت، خولق.

**هاژ:** هاج، سەرسام، گێژ. *

**هاژان:** هەژان.

**هاژواژ:** بڕوانە: هاج و واج.

**هاژوتن:** ئاژوتن.

**هاژێله:** کوژەکه.

**هاس** (بابا.): گیایەکی ئەستوورو کەناری گەڵاکانی دڕاویه، ڕەنگی زۆر سەوزێکی تۆخه.

**هاسان:** ئاسان، سانا، خۆش. ــ ی: ئاسانی، سانایی.

**هاش** (باک.): دڵخۆش، کەیفخۆش. ــ کردن: دڵخۆش کردن.

**هاشه:** (کە.) هاژه. (باک.) سوو، گوڤین، گڤه. ــ ی با: (باک.) سووابیّ، شەپێ. ــ ی ئاوی هاتن: چزیان، چزین. بۆ چەک.

**هاشەهاش:** گڤەگڤ، هاژەهاژ، هزهاز، فشافش، گووش گووش، هووفەهووف. ــ ی ئاوی: هاژەهاژی ئاویّ. *

**هاش و هووش:** بەچاوورڕاو، بەنازەوه، بەشانازی.

**هاف** (باک.): بەروونکار، کۆمەڵه، ئامادەبوون، ئەمز چووم هافامیر: چوومە خزمەت میر. ئەم بهافا هەڤ کەتین: ئێمە بەیەکتر گەیشتین.

**هافرتی** (باک.): گوومرگ، دەروازەوانی.

**هافدەم:** هاودەم، ــ ی: هاودەمی.

**هافل** (باک.): قازانج، سوود، کەڵک.

**هافلیشک** (باک.): زمانێکی چکۆلەی ئاسنه لە ژێرەوەی ئەنباری تفەنگییه.

**هافتین:** ئاوێژتن.

**هافرونگ** (باک.): کەژ، کەش.

**هافی** (باک.): بێگانه، بیانی.

**هافێرتن:** هاوێژتن، ئاوێژتن.

**هافێن** (باک.): هەویرترش، (بڕوانە هەوێن).

**هافین** (باک.): هاوین. ــ گه (باک.): هاوینەهەوار، زۆزان. ــ ی (باک.): هاوینی. ــ ی سەر (باک.): جل و بەرگی هاوینه، پۆشاکی هاوینه.

**هاکا** (دزه.، بابا.، کە.): وەخته، نێزیکه، خەریکه: ــ ڕۆژهەڵیّ.

**هاکۆ:** بەخۆ، سەرپێیی.

**هاگا** (خۆ.): ئاگا *

**هاڵ** (کە.): ئاڵ. ــ بوون: ئاڵ بوونی دانان. (جا.) شیّ بۆ وڵاخی بەرزه.

**هاڵا** (کە.): هانا، فریا، سکاڵا.

**هالان** (باک.): ئازا، بوێر، کەسێکه زۆر بەخۆی هەڵبلێ.

**هالاو:** هەڵاو، ــ ی ئاوری، گەرمی، (باک.) ئیتوون. هەڵم. ــ ی ئاوی گەرم.

**هاله** (باک.): گەمەیەکه.

**هاڵه** (کە.، هەو.): (ڕۆژ.) گۆڵەی زمانی وڵاخانه، ئاڵه.

**هاڵەپیرێژنانه:** نارنجیو، لیمۆ، ترنجۆک.

**هالەت** (باک.): گاسن.

**هاڵەکۆک** (هەورا.): ئاڵەکۆک.

**هالەکووی:** لەکوویندەریّ، لە کوێیه.

**هالەوکردن:** خۆشی، کات ڕابواردن.

**هالەینه:** لەولاوه، لەئەولا، لەوێندەریّ.

**هالبوون:** هەڵسان، هەستان.

**هالکەتی** (باک.): پەست، خراپ، نابووت، مایەپووچ.

**هاڵۆ** (ڕۆژ.، شەبه.، کە.): خاڵ، برای دایک. (شن.) جر، کوز (دیزه و گۆزه)، (باک.) هەروەکوو.

**هالۆژن:** خالۆژن.

**هالۆزمالۆز:** شلۆق و شێواو، ناخۆش.

**هالۆلک** (باک.): جێژنانە، دیاری سالی تازە.

**هالووبەلالووک:** ئالوبالو.

**هالی** (هەورا.): قۆرە، پەسیرە. بەتال، بۆش.

**هالێ** (هەورا.): قۆرە. چونکوو ددان ئال دەکاتەوە ــ پێی دەلێن.

**هالینە** (باک.): چێشتێکە لە باینجان و گۆشتییە.

**هالینگا** (کە.): خالگە.

**هالینگە** (هەورا.): خالگە.

**هام:** هاو.

**هامار** (فە.): ڕێک، تەخت، ڕاست بە بێ بلند و نزمی.

**هاملا:** هەموو، گشت.

**هامەیاری** (دەر.): یاریدە.

**هامپا:** هاوکار، هاوشان.

**هامپێز:** ئامێز.

**هام لفە** (فە.): دووانە، جمک.

**هام خەو:** ژن، خێزان.

**هامدەس:** هاودەست.

**هامدەم:** هاودەم، هەمدەم.

**هامڕا:** هاوڕێ.

**هامڕاز:** هاوڕاز. ــ ی: هاوڕازی.

**هامڕایی:** هاوڕێیی.

**هام و شۆ:** هاتووچۆ. ــ ی یەکتری کردن: سەردان و بەیەکتری گەیشتن.

**هامزاوا** (دەر.): ئاوالزاوا، هاوەلزاوا، دوو مرۆ خێزانیان خوشک بن.

**هامسا** (کە.): دراوسێ، هاوسێ. ــ یی: دراوسێیی.

**هامسەر** (هەورا.): هاوسەر، برادەر، هاوڕێ.

**هامن** (هەورا.): هاوین.

**هامێز:** ئامێز، باوەش.

**هامێن** (هەورا.): بڕوانە: هەوێن.

**هامێتە** (فە.): ئاوێتە، تێکەلاو.

**هان:** (باک.) ئاران. گال، دنە، فیک، هەت، فیت. ــ دان: گالدان، دنەدان، ئاران دان.

**هانا:** فریا، چەپالە، بەهاوارەوەهاتن (بۆکاتی تەنگانە و لێقەومان). بە ــ وەهاتن: فریاکەوتن، بەهاوارەوەهاتن. ــ بردن: پەنابردن. ــ بەر: پەنابەر، خۆ چەپالەدان.

**هانە** (هەورا.): کانی ئاوێ، سەرچاوە.

**هانەدرۆنە** (هەورا.): بەهارەکانی، بووارەکانی، کوێرەکانی.

**هانەهان:** هانکەهانک. ــ ی پیران: ــ ی ماندووان.

**هاندان:** بزاوتن، بزواندن، جولاندن، زل کردن. (باک.) بەء جادن، بزڤاندن، گالدان، ئاودان، فیت دان. (باک.) بکولۆک، ئاران، ئاڤراختن، بەلشاندن، بۆنگ کردن، هەرمێ، شەولقاندن.

**هانەر:** بزوێنەر. (باک.) بزکانۆ، بزڤانۆک، پەژقا، هەندەر.

**هاندراو:** بزوێندراو.*

**هاندران:** شەولقین، کەربین.

**هانکە:** هەناسەی توند لەبەر ماندوێتی.*

**هانکەهانک:** هلکەهلک، هەناسکەهەناسک، خیتەخیت، هینەهین، هانەهان. لە ماندووێتیدا و بە تایبەتی لەکاتی هەوراز وەسەرکەوتندا تەنگەنەفەس بوون، تەنگەنەفەس لە ماندوێتی.

**هانێ:** ها، بگرە، ئەوەتا، ببینە.

**هانین:** هێنان.

**هاو:** هاوال، هەم، هەو، هام، هەروەها.

**هاوا** (ڕۆژ.): هەودا.

**هاوار:** وا، واە، وەیل، بانگین، چریکە، قیژە، بانگ، بان، فەریاد، ئامان، ئەمان، داد، داد و فوغان و ڕۆڕۆ. نێوی پیاوانە. (باک.) ئەنین، هەوار. ــ کردن: بانگ کردن، چریکاندن، چرین، قیژاندن، هەلدان. ــ لێ کردن: دان بەرکیرا، دەنگ کردن. بە ــ ەوەهاتن: فریاکەوتن، بەهاناوەهاتن. ــ کەر: چەرەندە، بانگکەر. بە ــ: زاربەهاوار، نەڕڕە، فەریاد.

**هاوارکەر:** هاوارکار*

**هاوارکردن:** ژارین، لالانەوە، (فە.) ویلان.

**هاوارهاوار:** چریکەچریک، قیژەقیژ، هاوار و بانگ، نەڕەنەڕ، گازەگاز.

**هاوار و داد:** داد و هاوار، زارەزار، ئەنین، فیزار.

**هاوال:** بۆکچان: دەستەخوشک. بۆ نێرینان: هاوڕێ، هاودەنگ، بەردەڤک، (باک.) هەڤال، دۆست، هاودەم، ئاوال، دەستەبرا، ئامبایی، هاوەل، هەڤڕی، هاوتەمەن.

**هاوالایەتی:** هاوڕێیی، دۆستایەتی، ئامرایی، هەڤالی، سەدمێر.

**هاوال منداڵ:** ئاوال مندال.

**هاوان:** ئاونگ، هاون، هاوەن.

**هاوئاواز:** کەسێکە، کە دەنگی لەگەل دەنگی یەکێکی تەواو ڕێک کەوێ و وێی بچێ.

**هاوەل** (باک.): ئاوال.

**هاوەن:** بڕوانە: هاوان.*

**هاوباب:** ئاوباب.

**هاوبەزا** (کە.): هاوتەمەن، هەوزێ.

**هاوبەش:** هەڤبەش، هەڤپار، نیوەکار. ــ ی: بەشداری. ــ یتی: بەشدارێتی. ــ ی کردن: بەشداری کردن.

**هاوبەشگە:** هاوبەش، بەشداربوون، کۆمپانیا.

**هاوبەشگەی گوازتنەوە:** کۆمپانیای گوازتنەوە.

**هاوبرگە:** هامبرگە.*

**هاوپا:** ئامپا، وەک یەک، هاوپیشە.

**هاوپایە:** هاوشان، بەڤل.

**هاوپەیمان:** سوێندخۆر. ــ ی: سوێندخۆری.

**هاوپشت:** یارمەتیدەر، یەک بنەمالە، یەک بەرەباب، کەس و کار. ــ ی: یارمەتیدان، خزمایەتی، هاوخوێنی.

**هاوپیشه:** هاوکار، هاوپا، ئامپا.

**هاوتا:** هەمتا، هاوشان، هەڤسەر، هەڤپەر، هاوتەڤا، هەمپا، هەڤروو، هەڤنیر. بێ ـــ: بێ هەمپا، بێ هەڤبەر، بێ نموونە، بێ هەمپەر، یەکتا. بێ ـــ یی: بێ هەمپایی، بێ هەڤبەری، یەکتا. ـــ یی: هاوشانی، هەڤبەری، هەڤری، هەڤریتی.

**هاوتەوا** (کە.): هاوتا.

**هاوتەرزوو:** هام تەرازوو.*

**هاوتەک:** هاوتا، لنگە.*

**هاوتەمەن:** هاوساڵ، هاوسا، بەزا، هاوزێ، هاوبەزا.

**هاوتیرە:** هاوتەمەن. هاوڕەگەز.*

**هاوجفت:** هاوجووت.*

**هاوجووت:** هاوجفت، ژنی حەلال.*

**هاوجێ:** هاونیشتمان. هاوشان.

**هاوجۆر:** یەکسو، وەک یەکتری، هاوچەشن.*

**هاوچاخ:** هاوچەرخ.*

**هاوچارشێو:** هاوتا، هاوەڵ، هاوکار.*

**هاوچاو:** چاولێکەر، ئاگادار.*

**هاوچەشن:** هاوجۆر. ـــ ی: هاوجۆری.*

**هاوچرە:** ئەو کەسەیە گۆرانی دەگێڕێتەوە.

**هاوخاک:** هاونیشتمان. دوو کەس، کە خاکەکانیان لێک دەگەڕێتەوە، هاوجووت.*

**هاوخەف:** هاوسەر.*

**هاوخەو:** هاوسەر.*

**هاوخوێن:** هاوڕەگەز.*

**هاودەرد:** هاوخەم. دوو کەسن، کە بە دەست دەردێکەوە گیرۆدەن.*

**هاودەست:** هامدەست.

**هاودەم:** هاوچاخ، هاوکات، هاوڵ، هامدەم، هاونشین، هاڤدەم، (باک.) بەردەڤک. نێوی ئافرەتانە. ـــ ی: هاونشینی.

**هاودەمایەتی:** هامدەمی، هاوڕێیایەتی.*

**هاودەس:** چەند کەس شەریک لە کەین و بەیندا.*

**هاودەنگ:** ئاودەنگ، هاواڵ، هەڤدەنگ، ئاواڵ، ڕێک کەوتوو. ـــ ی: ئاودەنگی، هاواڵی.

**هاوڕ** (کە.): ئاوڕ.

**هاوڕا:** هۆگر، یەک بیروڕا.

**هاوڕاز:** (باک.) بەردەڤک، هامراز، ئامراز. ـــ ی: هامرازی، ئامرازی.

**هاوڕەنگ:** هەڤڕەنگ، ڕێک چوو. ـــ ی: هەڤڕەنگی، وێکچوویی.*

**هاوڕدانەوە** (دەر.): ئاوڕدانەوە، کۆمەگی و یارمەتی کردن.

**هاوردن** (هەمە.، دەر.): هێنان.

**هاودڵ:** هەڤدڵ، یەک گرتن. ـــ ی: هەڤدڵی، یەکێتی.

**هاوڕهاوڕ:** جارجارە.

**هاوڕێ:** هامڕا، هاواڵ، ئاواڵ، جەوسک، هەڤڕەھ، ڕیهەڤ.

**هاوڕێک:** تەریب.

**هاوڕێگە:** دۆست، هاواڵ.*

**هاوڕێیی:** هامڕێ، هاواڵ، هاوڕێتی، ئامرایی، ڕیهەڤی، هاوڕایی.

**هاوزا:** هاوزێ، ئاوزێ، هاوشان، هاوزە.

**هاوزاوا:** ئاواڵ زاوا.

**هاوزە** (هەورا.): هاوشان، هاوزێ، هاوزا.

**هاوزگە:** جمک.

**هاوزمان:** هامزمان، هەڤزمان. ـــ ی: هامزمانی، هەڤزمانی.

**هاوزێ:** (هەورا.) هاوزە، هاوتەمەن، هاوشان، بەزا.

**هاوس:** ئاوس.

**هاوسا** (هەورا.): هاوساڵ. (کە.) هاوسێ، دەراوسێ.

**هاوساڵ:** (هەورا.) هاوسا، هاوتەمەن.

**هاوسەر:** خێزان، هاوخەو، هاوسەنیر، ژن و مێرد بۆ یەکتری دەتوانن بەکاربێن. ئاواڵی ژنان.

**هاوسەرکەم:** ئاوسەرکەم. بڕوانە: هەژار. ـــ ی: ئاوسەرکەمی.

**هاوسەری:** ژن و مێردایەتی، خێزانداریتی، هاوسەرێتی. بۆ ـــ دەست دان: مارەیی لێک هاتن، پێک شیان، لێک دروست بوون.

**هاوسەنیر:** هاوسەر.

**هاوسەنگ:** لەکێشاندا بەرامبەر. لەکارو کردەوەدا چوون یەک.*
**هاوسەنگێتی:** بڕوانە: هاوسەنگ.

**هاوسوێند:** هاوپەیمان.

**هاوسێ:** دراوسێ، ئامسا، دەراوسێ. ـــ یەتی: هاوسێتی، هاوسێیی، ئامسایی.

**هاووک** (ڕەوا.): ئەوک، گەروو، گەردن.

**هاوشار:** خۆولات. ـــ ی: هایشاری، هاوولاتی، خۆولاتی، هەمشاری.

**هاوشان:** هەمبەر، هاوتا، هاولف، تا، ئاواڵ، ئاوشان، تەراز، یەکتا، هەمپا، هەڤبەر، بەڤل. بێ ـــ: بێ هەڤبەر، بێ هەمپا، یەکتایی. ـــ ی: هاوتایی، ئامتایی. (باک.) ئەمپایی.

**هاوقەتار:** چەن کەسێکن، کە خزمەتی گەورەیەک بکەن.*

**هاوکات:** هاوچەرخ، لەوکاتەدا، لەم بەروارەدا.

**هاوکار:** هەڤبەهرە، لف، هەمپا، بەشدار، هاوبەش، هەڤای، هەڤ پیشە، پیشکەنی. ـــ ی: بەشداری، هەڤپایی، یارمەتی یەکتری دان. ـــ کردن: دەست گرتن.

**هاوکاسە:** هاوخۆراک.*

**هاوکەوشەن** (گەڵ.): هاوسنوور.

**هاوکووف:** هاوشان، ئاوکووف.

**هاوکێش:** بە دوو شت دەڵێن، کە لە کێشاندا وەک یەک وابن، هاوسەنگ.*

**هاوکێشە:** هاوسەنگە، لە بیرکاریدا هاوکێشە سادەکان، هاوکێشە گشتییەکان، هاوکێشە سێ گۆشەییەکان بەکاردێن.*

**هاوکێشی:** هاوسەنگی.

**هاوگەڕی:** ڕێژە.*

**هاوگیان** (کۆ. ، هەو. ): ژنی برا بۆ ژنی براکەی دی دەبێتە هاوگیان.

هێوەرژن. ـــ ی: هێوەرژنی.

**هاوڵاتی:** هاوشاری.

**هاوڵە:** گرێیی.

**هاوڵەدار:** گرێیێ.

**هاولف** (ڕۆژ. ): هاوشان، ئەو پاڵەوانانە هاولفن، ئەو گایانە هاولفن. هاونیل.

**هاون:** (کۆ. ) ئاونگ، هاوان، بە ئاونگی مسی زەرد و جۆنی چکۆڵەش دەڵێن.

**هاوناو:** ئەو کەسانەی ناویان وەکو یەکن. هەڤناڤ.

**هاونرخ:** (باک. ) بەردیلک.

**هاونشین:** هاودەم. ـــ ی: هاودەمی.

**هاونیر:** هاوتا، هاونیل، هەڤ نیر.

**هاونگ:** دەسکاونگ، ئاونگ، ئاوان.

**هاونۆگە:** هاونۆبە.*

**هاونێو:** هەڤناڤ.

**هاونیر:** هاوگا.

**هاونیشتمان:** هاوولاتی.

**هاونیل** (ڕۆژ. ): هاولف، ئەو گاجوتانە لەگەڵ ئەوەکە هاونیلە، واتا جووتی یەکن زیاد و کەمی تێدانییە.

**هاوور هاوور** (ڕۆژ. ): جارجارە، جارە نا جارێکی.

**هاونێڵە:** هاوگا.

**هاو واتا:** دوو یا چەند وشەیەکی جیاواز کە واتایان وەکو یەک بێ.

**هاوهاو:** مرازی بانگ کردنە، هۆهۆ.

**هاو وێنەکان:** بەرامبەر یەکەکان، وێک چوەکان (لە هاوکێشە کیمیاوییەکاندا).

**هاوها:** هەرا.

**هاویە:** کاریە.

**هاوێر** (هەورا. ): هەڵاواردن، جوێ کردنەوەی ماڵاتان. ـــ کرن: (باک. ) نێوەڕاست.

**هاوێژ:** ئاوێژ، ئاوێژەر.

**هاوێژەر:** ئاوێژەر.*

**هاوێش** (سور. ): بێدەنگ، ئارام.

**هاوێتن:** هاوێشتن، پلارکردن، فڕێدان.

**هاویر** (باک. ): ـــ کردن: هەڵاواردن.

**هاویردۆر** (باک. ): دەور وبەر، چواردەورە، دەور و پشت.

**هاویژتن:** ئاوێژتن.

**هاویشتن:** ئاوێژتن.

**هـاوین:** (ڕۆژ. ، دەر. ) تاوستان. (ڕۆژ. ، ئـەردە. ) تاوسان، هـاڤین. (مـوک. ) ـــ ی: هاڤینی، هاوینە، شیرە و گـەرم، شیلەوگەرم، گـەرم و سەرد، بۆ ئاو و شلەمەنییەکی بەکاردەبرێ، کە نەسارد و نەگەرم بێ، تاوسانی.

**هاوینەوەر:** هاوینگەڕ.*

**هاوینان:** کاتی هاوین.*

**هاوینەوار:** (باک. ) هاوینگە، بان، وار، کوێستان، بانەمەڕ. جێگایەکە لە هاویناندا فێنک و شینایی و باغ و باغاتی زۆربێ.

**هاوینگا:** هاڤینگا.

**هاوینگە:** بان، هاوینەوار.

**هاوینگەڕ:** هاوینەوەر.*

**هاها:** وەڵامی کەسێکە، کە باوەڕ بە قسەی بەرامبەرەکەی نەکات.*

**هاهاء:** هەیها. بۆ واق و ورمانە. ئاهاء، حەتەق، هەلاّ، ها، هەتەق، تەح، تەحا، پەح، پەحا، پیک، حەکو، (باک. ) هاهۆ، حاحا. لە وەڵامی گاڵتە پێ کردندا بەکاردەبرێ، ها، حەء، حیو.

**هاهاو:** بانگکردنی دوور.*

**هاهۆ** (باک. ): هاها.

**های** (باک. ): ئاگا. من های ژێ بوو: من ئاگام لێ بوو. هایی من تو نەبوو: من هیچ ئاگام لەتو نەبوو. (موک. ) بۆ دەنگ دانە: هۆی، ئاها، ئەیا. لەکاتی دیتنی چتی سەیردا.

**های و هوو:** هەرا هەرا.

**های های:** وشەیەکە لە کاتی سەرسووڕمان یا ئازار و خەم و پەرۆشدا بەکاردەبرێ.

**هایهۆ:** ئایهۆ، هەیهۆ، ئەیهۆ، لەجێ باوەڕنەکردن یا تووڕەییدا.

**هە** (باک. ): ها.

**هەء:** نەء، نە، نا، نەخێر، چ. چا.

**هەبان** (باک. ): هەگبە، خوورجین.

**هەبت:** پەند. ببێ.*

**هەبۆسان** (باک. ): ڕازیانەی ڕۆمی.

**هەبوو:** دەوڵەمەند.

**هەبوون:** بوون، هەبین، دارایی، دەوڵەمەندی، (لو. ، فە. ) بوون، داشتن. من هەمە: (باک. ) من هەیە. من بووم: ئەز هەبووم. (دەر. ) بین، هەبین. ـــ ی: دەوڵەمەندی، سامانداری، توانای دارایی.

**هەبین** (هەورا. ): بوون، هەبوون.

**هەپە** (خۆ. ، جا. ): مژانـە، (دزە. ، دەر. ) خەپەی هەوجاڕی جوتییە. (جا. ) گەلە.

**هەپەڵۆک** (کە. ): ئەپلۆک، هەپلۆک. (هەورا. ) قیزبەلە، قیزبەلە، گیایەکە دەخورێ.

**هەپروون:** وورد و خاش، لەت و کوت.* ـــ بە هەپروون: لەت و کوت. ـــ کردن: وورد و خاشکردن.*

**هەپش** (باک. ): پشمین.

**هەپک** (ڕۆژ. ، باک. ): ئەوداریە، کە بۆ کوتانەوەی چنراو بەکاردەبرێ. کەرکیت.

**هەپلەگون** (دزە.): نەفام، کەمزان.

**هەپلۆک** (ڕۆژ.): هەپەلۆک. (هەو.) قیزبەلە، قزبەلە. گیایەکە ٣ ـ ٤ پەلکە، سەری ڕەشە و پاک دەکرێ و دەخورێ. دزەیی پێی دەڵێن قیزبەلـە. (کە.) ئەپلۆک.

**هەپەپۆک**: (دزە.) قەپقەپۆک.

**هەپۆ** (بۆڵ.، باک.): کەرکیت، هەپک.

**هەپۆکە** (ڕەوا.): گیایەکە.

**هەپوو**: پەپوو، برا، نەما، زاراوەی منداڵانە.

**هەت** (ڕۆژ.، کە.): هاندان، بۆ هاندانی سەگی بەکاردەبرێ وەکو: دەی. ـ کردن: هاندان.

**هەتا**: هەیا، هەتاکوو، هەیانی، تاکی، دا.

**هەتار**: کوتکی گەورە، بەردی گەورەی گلارە بوو لە کێو.*

**هەتاکەی**: تاکەی، هەتا چ کاتێک، هەتاکەنگی، بۆ پرسیارکردنە لـە ماوە.

**هەتاکو**: تاکو، تا، دا.

**هەتاکوێ**: تاکوێ، هەتا چ شوێنێک، بۆ پرسیارکردنە لە شوێن و کات.

**هەتاسەر**: هەتاهەتایە.

**هەتان** (ڕەوا.، هەو.): پەرژینێکە بە تانۆکی چنرابێ.

**هەتاو**: خۆر، ڕۆژ، تاو، هەتاف، نێوی ئافرەتانـە، تیشـکی ڕۆژییـە. ـ دەرچوون: خۆردەرچوون، خۆرهەڵاتن.

**هەتاوبردن**: خۆرانگازبوون، تاوبردن.

**هەتاوبردوو**: تاوبردوو، خۆرانگاز.

**هەتاوگاز**: تاوگاز، تاوبردوو. ـ بوون: تاوبردن، تاوگازبوون.

**هەتاهەتایی**: (باک.) مایەندە، جاویدان، هەتاهەتا، هەتاسەر، بپربپر، بپرای بپرای، بێ پێش و دوایی، بێ بەر و دوایی، هەر و هەر.

**هەتاوسەنج**: (موک.) ڕۆژنووس.

**هەتتان** (گەر.): کردەوەیەکە لە سەرەتای بزن بڕینـەوە و ڕستن تـا دەکرێتـە ڕەشماڵ ـ ی پێ دەڵێن.

**هەتەد**: هەتادوایی.

**هەتەر**: (کە.، هەو.) ڕکو، کار، دیتن. چاوی ـ ی لێ ناکا: چاوی کـاری لێ ناکا. هەتاچاو ـ بکات: هەتا چاو ببینێ. (کـە.، هـەو.) لەسـەر ڕۆیشتن، لەسەرچوون، ڕک، ڕکە، پەرس درێژکـردن، بنـار، هـەڤرک، پێ داگرتن، لەسەرڕۆیین، لەبەردان. ڕەک، نۆ.

**هەتەرێ**: ووتەیەکە لە نەوروزدا دەکوترێ بە واتای نەی ئاگر.*

**هەتەرێ و مەتەرێ**: لە میتۆلۆژیای کوردیدا ناوی دوو فریشتە (ئازەر و میهر) یە.*

**هەتەق**: هاها، لەکاتی باوەڕ نەکردندا یا گەمە پێکردندا بەکاردەبرێ.

**هەتەڵ**: مەتەڵ، (هەو.) مەیل.

**هەتەدەر**: (ڕۆژ.، کە.) هاندەر.

**هەترە**: (هەو.) بار ڕووتی، (دەر.) هەڵەتە، تار، هەتلە، ئاوارە، فرندان، هەڵفراندن. ـ بوون: ئاوارەبوون، ـ کردن: فراندن.

**هەترەش** (خۆ.): نەترە، زەهلە، زراوچوون، تۆقین. ـ چوون.

**هەترێ و مەترێ**: بەهەمەحاڵ، بەهەرحاڵ، بەهەرچۆنێکی بێ.

**هەتک**: هتک، کەتن، ئەتک، (کە.) ئەرتک. بەپەندبردن. ـ کردن: ئابڕووبردن.

**هەتکاندن** (باک.): هەتک کردن، بەپەندبردن، ئابڕووبردن.

**هەتک کەر**: ئابڕووبەر.*

**هەتکین** (باک.): ئەتک کران.

**هەتلە**: تار، ئاوارە، گوم، بزر، هەترە، ئاوارەبوونی باڵندان و مرۆ لـە جێگای خۆیان لەترسان. ڕێگام ـ کردووە. ـ بوون: گوم و ئاوارەبوون.

**هەتووان** (موک.): دەرمان، مەڵحەم. ـ ی نەمردن.

**هەتوڵ مەتوڵ**: جوورە یارییەکی منداڵانە.*

**هەتیم** (هەو.): هەتیو، سێوی.

**هەتیو**: سێوی، وڵ، هێتیو، هەتی.

**هەتیوباز**: نێرباز.

**هەتیوچە**: هێتیوچە، هەتمچە.

**هەتیوگێ**: قونگێ.

**هەتیوی**: هەتیوێتی، سێوێتی.

**هەتیوێتی**: هەتیوی.

**هەج** (کە.): یاخی. ـ بوون: یاخی بوون.

**هەجان**: هۆزێکی کوردە لە بادیناندا.

**هەجە** (باک.): خونچە. قەدەغەکردن.

**هەجەل** (باک.): دەرامەت، دەسکەوتی ڕۆژانە یا ساڵانە.

**هەجناندن** (باک.): لارازکردن.

**هەجنین** (باک.): داهێزان، لەش گران بوون.*

**هەجووجک**: دەنکی هەرمێ.*

**هەچ** (کە.): هەستان.

**هەچە**: حەچە، ڕەچچە (زاراوەی منداڵان).

**هەچەهەچە**: حەچە، حەچچە. (بۆ لێخوڕینی کەرێ).

**هەچک** (باک.): گۆچان.

**هەچکۆچی** (هەورا.): مێوژ.

**هەچەهەچک** (باک.): پەرەسلێرکە.

**هەچی**: (باک.) هەرچی، وەکو، ئەگەر. (باد.) هیچ. (باک.) گۆچان. (زا.) چەلاک.

**هەدا**: (موک.) مۆڵەت، دەرفەت. (بابا.) ئۆقرە، هێدی، هێواش، ئارام، کپ، مات. ـ دان: هێدی بوون، بێدەنگ بوون. ئۆقرەگرتن، هەدرین، هەدین.

**هەدار** (باک.): ئاسان، شاد، هەدا، ئارام. ـ ی (باک.): ئاسانی، ئارامی. هەدارا من نەدهات: نەمدەتوانی ئارام و ئاسوودەبم.

**هەدارهەدارانێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانە.

**هەدام** (باد.): ئەندام.

**هەدەر**: خۆڕایی. بە ـ چوون، بە ـ دان.

**هەدراندن** (باک.): ئارام و هێدی کردن.

**هەدرەش** (باک.): ئەنجام.

**هەدرین** (باک.): ئارام و هێدی بوون، هەدادان.

**هەدشە** (باد.): زیپکەیەکی گچکەیە و ئاوی زۆر لێ دێت هەموو لەش دەیگرێتەوە.

**هەدناندن** (باک.): ئارام و هێدی کردن.

**هەدنین** (باک.): ئارام بوون، هەدادان.

**هەر**: کام، کێها، (هەورا.، شە.، ڕۆژ.) کەر، گوێ درێژ. (باک.) تەنها، هەر، هەرجار، هەمیشە، هەرگاف. ـ جاراکۆ: هەرجارەی کە. ـ وهەر: بەردەوام، هەمیشە.

**هەڕ** (هەورا.): قوڕ.

**هەرا**: گۆبەند، هات و هاوار، غەوغا، خەلپە، غەلبە، قڕە، چەقە، چەقەچەق، هۆریا، کێشە، گاشە، خرسجر، پشێوی، دەنگەدەنگ، هەڵڵا. (باک.) بلخاخ، شەڕوشۆڕ، قریشتە. ـ بەرپاکردن: قەوماندن. ـ داگیرساندن: هەرادامەزراندن. ـ هەڵگیرساندن.

**هەڕڕ**: زەڕڕ.

**هەڕاڵە** (هەورا.): هەلاڵە (گوڵ).

**هەڕا**: غار، ڕاکردن. ـ کردن: غاردان، شکان، بەزین، لنگدان، هەڵاتن.

**هەراهەرا**: دەنگەدەنگ، گوڕڕە، قریشت و هۆڕ، کێشەکێش، غەڵبەغەڵب. گاڵەگاڵ. قرەقڕ، های و هوو، بلخبلخ، قاوەقاو، غەوغا، رمین، شەرقین، چەقەچەق.

**هەرنادەن، هەرنازەن** (هەورا.): هەرنەوە.

**هەڕاج**: حەراج.

**هەراس**: ترس، ساف، وەرەزکردن. ـ لێ هەڵگرتن: ئاسوودەیی لێ هەڵگرتن.

**هەراسان**: بێزار، جاڕس، وەڕەز، کەوەڕێ. ـ کردن: جاڕسکردن، دانزلین.

**هەراسە**: وانێک، وانەک، هێن.*

**هەراش**: بەتەمەن یا قەلافەت و بەژن گەورە. بۆ دار، گیا، منداڵ، جوجکە و گوێلک و بەرخ و کاریلان بە کاردەبرێ، کە گەورە بوبن دەڵێن: هەراش بووە. (باک.) فەرازی. بۆر. ستر.

**هەراش نەوس**: ئاوسێکی ئاشکرایە.

**هەرفتن** (کە.، باک.): تێکچوون، ڕووخان، تەپین.

**هەرامە**: هێن، وانەک، وانێک، واک، گۆرین، کابرا، ئەوک، جاییێ، جوامێر، جوانمێر.

**هەرو** (ڕەوا.): جوورە گیایەکە ئاژاڵ بیخوا پێی دەمرێ چونکو لەناوبەری گیایەکەدا کرمێکی کوژندەهەیە.

**هەروە**: ئازار، ئاهۆ، چاوقووڵکە، ڕشانەوە، قڕان، درۆم.

**هەروکێشە**: قرتە.

**هەروهوریا**: هەراهەرا، قیرەقیر، چەقەچەق، چرەوە، زییل، کێشەکێش، بلخاخ، شەڕوشۆڕ، بگرە و بەردە، دەنگ، بەردەقە.

**هەرە**: (باک.) سەکۆ، تەپۆڵکە، ئێجگار، گەلێک، ئی هەرەپتر.

**هەرئیسە**: هەرئێستا.

**هەڕە**: بڕۆ، هەڕۆ. (موک.) کرەکردن. ـ کردن (سەق.): پەڕش لێکردن. (هەورا.) قووچکە، کرمێکی سپیە شەتلی توتنی دەخوا. ـی لە بڕەی ناکاتەوە: هێندە ئازیرەکە کرمی لەبڕکەی جوێ ناکاتەوە. مشار، دیواری نازک.

**هەڕەبان** (هەورا.): قوڕەبان.

**هەڕەبەنگ** (هەورا.): برایە بۆگەنە، گیایەکە.

**هەڕەگ**: هەڕەت، چەڵکە، کات، بافت، تانگ، تاف، تافتاف، جەنگە، گۆنەر، گۆنگەڵ. هەرچتێکی بگاتە کاتی گەیشتن، دەڵێن: هەڕەتیەتی: جەنگەڵیەتی. هێز، پەڕوپەو، پەڵوپۆ. ـی لەبەردانەماوە. ـی جحێڵی: جەنگەی جحێڵی.

**هەڕەپەس** (هەورا.): قوڕەپەست.

**هەڕەزانە** (فە.): جۆلانە.

**هەڕەزانی** (کە.): جۆلانە.

**هەڕەزەڵە** (کە.): (هەو.) ڕەزڕەزۆک. پنجکێکە بەرێکی چکۆڵەی سوور دێنی دەخورێ و ترش و شیرینە، گەورەدەبێ بەرەکەی هێندەی دەنکە قەزوانێکە بەلاَن بە هێشوەیەوە.

**هەرەزەنی**: (هەو.) ئانیشک.

**هەرەس**: ڕنوو، ڕندک. (هەورا.) فرمێسک. (ڕەوا.) ڕەنی. ـ بردن (کۆ.، کە.، ڕۆژ.) قەڵەشان، درزبردن. (موک.، بابا.) پارچە زەوی یا کەندێکە یا کێوێکە بەزنا یا بە بروسک ڕووخابی و تیکچووبێ. ـ بردن: ڕووخان. ئاشۆت، ئاشیت. پارچەبەفرێکی زلە ڕووخابێ یا لە ڕووخانیدابێ. کۆمەڵە ولاَخ یا مالاَتێکە بەغار لە هەورازێکیەوە بێتە خوارێ، یا کۆما بەرد و گڵێکە یا چتێکی دیکەیە، کە بەیەکجاری بڕووخێ و بێتەخوارێ. (کە.) دیوارێکی هەرەسی بردبێ و شەق بووبێ.

**هەرەس هێنان**: ڕووخان.

**هەڕەس** (بابا.): لافاو.

**هەڕەسی** (هەورا.): قوڕەبان.

**هەڕەشە**: هەڕوگیف، گەف، گوڕڕە، گەفوگوڕ، گوڕەشە، گەزادە. ـ کردن: ترساندن. ـ لێکردن: گەزادەکێشان.

**هەڕەشە و گوڕەشە**: بڕوانە: هەڕەشە.

**هەڕەشیان** (شک.): لەنێوچوون.

**هەڕەشین** (شک.): هەڕەشیان، لەنێوچوون، خراپ بوون.

**هەڕەگەل** (هەورا.): کەرەگەل.

**هەرەگەورە**: هەرەمەزن.

**هەرەم**: (دزە.، خۆ.) هەرێم. (باک.) سرکۆ، کۆما، تەپۆڵکە.

**هەرەماسی**: جوورە ماسیەکە.

**هەڕەمە**: گەنم یا ئاردێکە لە چەند جۆرێک تێکەلاَو کرابن. (موک.) پەلە، تالوکە. بە ـ ڕێشت: بەتالوکە ڕێشت. (ڕۆژ.) ـی مافوور و بەرە: کری مافوور و بەڕە.

**هەڕەمین**: جێگای قەرەباڵغ.

**هەرەنگ** (فە.): توانایی، هێز.

**هەرەوەز** (موک.): (کۆ.، هەو.) زبارە. دەستەوا، دەستیار، ترومپا. لە جووت و دروێنە و گێرەدا بە نۆبە یارمەتی یەکتری دان. ـــ ی: زبارەیی، دەستەوایی.

**هەرەهەڕ**: زەرەزەڕ.

**هەڕەی لە بڕەی ناکاتەوە**: هەڕە: ڕۆیشتن، بڕە: بڕی چۆمان. هەڕی لەبڕی ناکاتەوە. هەڕە: کرمێکی سپی بڕکەی توتنانە. بڕە: بڕکە، مەبەس ئەوەیە: هێندە نازیرەکە نازانی هەرویر مانای چیە و نازانی کرمی لە بڕکەی جوێ کاتەوە.

**هەریژی**: بژی.

**هەربلاندن** (باک.): چەرخاندن، وەرگەڕاندن.

**هەربلین** (باک.): ئاوارەبوون، وەرگەڕان.

**هەربو** (هەورا.): هەریەکێ.

**هەربووە**: بڕوانە: هەربووگە*

**هەربووگە**: هەر هەبووە، زۆرکۆنە.

**هەربوون**: هەمیشە خاوەنی بوون. ـــ ی: هەمیشە خاوەنی هەبوونی.*

**هەربەرچقتن**: هەلاْمساندن، ئاوسان.

**هەربەرچوون** (ڕەوا.): هەلاْمسان، ئاوسان، پەنمان.

**هەربەندمان** (گەر.): قەلس و مەڕبوون، قەلْس و مەڕزکردن.

**هەرتا**: تا، هەتا، هەرچەند.

**هەرتەک** (خۆ.): کۆتایی، بنەبڕ. ـــ ی هێنا: بنی هێنا، کۆتایی کرد.

**هەرتک**: هەردووک، هەردوانیان.

**هەرجایی** (دا.): خۆتێ هەلْقورتێن.

**هەرجوو** (کۆ.): گلەیی، داوای یارمەتی لە خزمان.

**هەرجوول** (باک.): جوورە کوللەیەکە.

**هەرچەرخ** (باک.): هەمیشە.

**هەرچەند**: گەرچی، ئەگەرچی.

**هەرچۆنێ**: هەرچەند.

**هەر چۆنێکی**: هەرجۆرێکی.

**هەرچی**: هەچی. (کە.) پیاوی هیچ و پووچ.

**هەرچی پشکوان**: ئازار، مارت.

**هەرچی و پەرچی**: هەرزە، پیاوی هیچ و پووچ، بێ ڕەگەز و بنەچە.

**هەرخان** (ڕۆژ.): تەویلەی کەران.

**هەرد**: زەوی، عەرز، ئەرز.

**هەردە** (کە.، هەو.): بەردەلاْن.

**هەردەمێکی**: هەرکاتێکی، هەرساتێکی.

**هەردک**: هەردووک.

**هەردن** (لو.): خواردن.

**هەرد و هەلْەت** (جا.): زورگ و هەلْەت، زوورگ.

**هەردی** (باک.): دابێژراو بە هێلْەگی. نێوی پیاوانە.

**هەردین** (باک.): ترازان، جوێ بوونەوە، نەرم بوون. بهەردە.

**هەڕۆ**: بڕۆ.

**هەر ڕۆ** (باک.): هەر ڕۆژێکی، هەموو ڕۆژێکی.

**هەر ڕۆژە**: هەموو ڕۆژێک، هەر ڕۆژێک.

**هەرز**: فریزوو. (باک.) پێستی لەشی مرۆیە، کە هەلْقرچابێ لە گەرمان یا لە سەرمان.

**هەرزاڵ**: (هەو.) هەرزەڵ. (ڕەوا.، خۆ.) ئەستەرک. (باک.) ئەرزێل. (کە.) شووقەلەت. هەرزالْە، کوولین، پەیرک، ستەرک، ستێرک، هەرزێل: تەختی دارە بۆ لەسەر نوستن. کەڕۆکەیەکە لە ناو مالاْندا دەیکەن و چتمەکی لەسەر دادەنێن. تەختەیەکە بۆ زاد و دانەوێلْە دروست دەکرێ.

**هەرزالْەیی**: هۆزێکی کوردە.

**هەرزان**: خۆڕایی، بادی هەوا، (باک.) ئەرزان. ـــ ی: نرخی دەخلْ و چتی دی هاتنە خووارەوە. هاتنەخووارەوەی نرخ.

**هەرزە**: هەرچی و پەرچی، دلسقک، وەینەک، جیوەلەک، (باک.) گرزە، بەترف. کسێکە قسەی پڕوپووچ بکات. لەوجڕ، لەوچە، سووک، بلْح، خوێڕی.

**هەرزەکار** (هەلْ.): گەنج، لاو، جحێلْ، خورت، داوێن پیس، بەترەڤ. ـــ ی: جحێلی، لاوی.

**هەرزەگەڕ**: ئاوارە، چەرخچی، ڕاتوول، گاف قەلیش.

**هەرزەڵ** (هەو.): هەرزاڵ.

**هەرزەلْە**: تالْە، هەرزانی تالْ و گیایەکشیەتی. (هەو.) هەرزالْ، کەپر.

**هەرزەیی**: بێ شەرمی، بێ ئابڕوویی، سووکی، بلْحی، دلسقکاهی، ساتوولی، حیزەبخۆیی.

**هەرزن**: (کە.) ئەرزن، گارس، گالْ. چووار جوورە. ١) هەرزنەتالْە: گالْە (دەبێ بۆ بدرێ ئەوجا لە ئاشی بکرێ). ٢) هەرزنەگەورە: (خۆ.) دەرە. ٣) (شا.) هەرزنە گێلۆش. ٤) هەرزنە مێنە.

**هەرنەبێ**: هیچ نەبێ، بەلاْنی کەم.

**هەرزنە گەورە**: جوورێکە لە چوار جوورەکانی هەرزن.

**هەرزنەگێلۆوش** (شا.): یەکێکە لەچوار جوورەکانی هەرزن.

**هەرزنە مێ نە** (شا.): (کۆ.) خۆزە، (شا.) هەرزنە مێ یینە. هەرزنێکە باش و خۆش و شیرین و وردە.

**هەرزۆن** (هەورا.): هەرزان.

**هەرزۆک**: چرۆێکە ئاژالاْن گەلاْکانیان خواردبێ یا هەر پێیەوە نەمابێ.

**هەرزیل** (باک.): هەرزال، تەختی نوستنییە لە دارییە.

**هەرژین** (باک.): جوێ بوونەوە، ترازان، نەرم بوون.

**هەرس**: هرس، ورچ.

**هەرساندن**: فێرکردن.

**هەرستاندن** (باک.): ڕوخاندن، شکاندن،لێدان، ماندووکردن، هەرشاندن.

**هەرستن** (باک.): شکان، ڕووخان، ماندووبوون.

**هەرسین** (هەورا.): فرمێسکاوی.

**هەڕشان** (باد.): کولانەوە. ـــ دن: کولاندنەوە.

**هەرشاندن** (باک.): لێدان، شکان، کولاندنەوە.

**هەرشەم:** هێرش.

**هەرشتە:** (باک.) رشکە.

**هەرشین** (باک.): هەرستن، ڕوخان، لێدان، شکان.

**هەرڤان:** کولانەوە. ــ دن (باک.): خراپ و بێ کەڵک کردن، وێران کردن، کاول کردن.

**هەرفتاندن** (باک.): دەرمان کردنە هەویر بۆ خەڵەتاندن و دڵنەرم کردن و فروفێڵ. (باک.) هەرڤساندن.

**هەرفتن** (سور.، بار.): ڕووخانی خانو و دیوار، وێران و کاول بوون.

**هەرڤساندن** (باک.): هەرفتاندن، ڕووخاندن، وێران کردن.

**هەرفین:** خراپ و کاول بوون.

**هەرڤاندن:** وێران کردن، خراپ کردن، کولاندنەوە.

**هەرک:** ئەرک، هاتوچۆ، ڕەنج. (باک.) ئاها، هاوارێکە لە واق و ورمانێدا بەکاردەبرێ.

**هەڕک:** قوڕ، قوڕاو، لیت.

**هەرکەو:** (باک.) تەو. (هەورا.) کەواو. بەردێکی گەورە و قووڵە لە دەشت یا لە کێواندا ئاوی بارانەی تێدا ڕاوەستێ.

**هەرکۆ:** (هەورا.) هەرکوێیەکی.

**هەرگ:** بڕوانە: هەرک.

**هەرگا:** هەرکات، هەرگاڤ.*

**هەرگاڤ** (باک.): هەمیشە، هەرکات.

**هەرگاو:** قوڕاو.

**هەرگەلە** (ڕۆژ.): کەرەگەل.

**هەرگۆت:** هەڵگۆت.

**هەرگینە:** قاپ و دەفر و دیزەی گلی، سواڵەت.*

**هەرمان** (هەورا.): فەرمان، ئیش و کار، بەردەوامی، نەمری.

**هەرمان:** کاول بوون، وێران بوون، ڕووخان.

**هەرمە** (کە.): چنین.

**هەرمەڵێ** (هەورا.): هێرۆ (گوڵ).

**هەرمەنستان:** ئەرمەنستان.

**هەرمەنی:** ئەرمەنی.

**هەرملیسین:** هەڵمژین، مژینی مەمک یا قامک، یا گیایەکی بەتام و ئیدی.

**هەرمێ** (ڕۆژ.): هەرمێ، کرۆستک، کرۆسک، دارێکە بەبەرەکەشی دەڵێن ــ و شیرینە. نێوی ئافرەتانە. (هەورا.) مرۆی، مرۆ. کارچک، کارچف. (باک.) هاندان. میری هەرمێ: کەسێکە هانی خەڵکی بدات بۆ شەڕی و خۆشی تێوەنەدات. ــ لاسوورە: ئالیسۆر، لاسوورە.

**هەرمێشک:** (هەورا.، بابا.) سیپالوو ڕوەن. (دەر.) چنگاڵ، هەڤرووشک.

**هەرمێ کرووزی:** جورە هەرمێیەکە لە ترشیاتی دەکەن.

**هەرمێ کێویلە:** شکۆک. (باک.) شەکۆک، شکۆکە. دارە ــ: داراشکۆکێ. شەقوق: شەقووق، قارچک، کرۆسک.

**هەرمین** (هەو.): ڕمێن، بە ــ ە: بەرمێنە. داواکاری لە سەر زۆرە (شکا.، ئەم.، باک.) مردار، مندار، گڵاو، پیس، گیانلەبەری مردوو.

**هەرنەبێ** (باک.): بالۆ. بەلای کەم، هیچ نەبێ.

**هەرۆ** (باک.): ڕۆژانە.

**هەڕۆ** (هەورا.): قوڕ. بڕۆ، بچۆ.

**هەروا:** هەرئاوا.

**هەروە** (باک.): ئاوا، وەها، هەروەکی.

**هەروەک:** هەروەکو، لەچەشنی.*

**هەروەکوو:** پیستەنە، وەرگە، دەق، وانی، هاڵۆ، هەڤتۆنە.

**هەروەکی:** هەروەک.*

**هەروەر** (باک.): جوورە هەڵپەڕینێکە.

**هەروێ** (باک.): هەرۆ.

**هەڕوو:** بڕۆ، بچۆ. (کە.) بڕۆ (تەنها بۆسەگ).

**هەروو:** (هەورا.) هووڵوو.

**هەرووتن:** زۆر ڕۆیشتن لەسەر باسێک.*

**هەرووتی:** هۆزێکی کوردە هێندێکی لە دەشتی هەریر و هەندێکیشی لە نێوانی شاخەکانی ڕەواندز و هەریرێدان.

**هەرووشا** (هەورا.): کەروێشک.

**هەرۆشە** (ڕۆژ.): کەروێشک.

**هەرهەبێ:** پایەداربێ، پیت و پیرۆزی تێکەوێ، کە چتێکی بدەی بەیەکێکی بیخوا یا بخواتەوە بۆوی بەکار دەبات جا چتەکەی وەرگری یانا هەروا دەڵێ.

**هەردەم** (باک.): هەمیشە.*

**هەردووک** (باک.): هەڵووچە.

**هەروکێف:** هەرمشە، قسەی زل، قوورومە. ــ کردن: ترساندن.

**هەروهەر** (باک.): هەمیشە، هەتاهەتایە.

**هەرێ** (باد.): هەمیشە. (گەر.) پەیمان، بەڵێن. (باک.، باد.) ئەرێ، بەڵێ، ئایا. گەوج بوون.

**هەرێ دەر:** بەڵێندەر، گفت دەر.

**هەرێز** (هەورا.، ڕۆژ.، کرما.): فریز، فریزوو.

**هەرێس:** فریزوو، گیایەکە. (باک.) کۆراز، دڵمردوو، خۆپارێز.

**هەریسە:** چێشتێکە لە گەنمەکوتاوی دروست دەکرێ، تا دەنکەکانی دەتوێتەوە دەبێ بکوڵێ. (شن.، بابا.، هەورا.) کەشکەک، (بار.) بەشەو گەنمی کوتراو بە ئاوەوە دەڵێنن گۆشتیشی تێدەکەن، بەگەرمی بەداری تێک وەردەدرێت سبەینێ لە قاپانی دەکەن، ڕۆن یاهەنگوین یا دۆشاو یاشەربەتی کەمێک بەسەردادەکەن.

**هەریسان** (خۆ.، ڕەوا.): جێگایەکە لە دەست و پێ، کە زەبری وێکەوتبێ و کوترابێ و هەواو کێمی تێدا کۆببێتەوە، بلۆق کردن.

**هەرێ کردن** (خۆ.): دەست پێ کردن، لەسەر ڕۆیشتن، بڕیار لەسەردان.

**هەرێم:** هەرەم، هەڵەم، قوڵ، کاڤار، لای، قەرە. (ڕۆژ.) تووپر. توورە. ناوچە، مەڵبەند.

**هەڕێنا** (باک.): دڵاوڵدڵی، دوودڵی، ئیش کەتیە ـــ یی.

**هەڕێنی** (باک.): بەڵێنی، پەیمان.

**هەڕی** (باک.، یە.): قوڕ. (گەر.) پەیمان. (کە.) گەوج، کەمهۆش. ـــ بووە: لەژێر شۆڕاوەتەوە.

**هەڕیشە** (هەورا.): کەشکەک.

**هەڕین** (باک.): ئەستێرە، گەز لە ئانیشکەوە تا سەری قامکان. بۆڕەی ڕەشەوڵاخان. بۆڕاندن. هاڕین، ووردکردن.

**هەڕی لە بڕی ناکاتەوە**: هەڕەی لە بڕەی ناکاتەوە.

**هەز** (باک.) وشک و قەڵەشاو (زەوی). ـــ کردن: خۆشویستن، حەزکردن.

**هەزار**: دە جار سەت.

**هەزاران**: چەندهەزارێک، لەدووهەزار زیاتر.

**هەزارە**: (شا.، هەورا.) شوێنەونکە (بۆ نێچیر) و ئیدیکە بەکار دەبرێ. (باک.) گۆڵە. ـــ کردن: گۆڵەدان. (ڕۆژ.) شەوبێداری، شەو نەنوستن بە خەفەتەوە.

**هەزارە زیلە**: بەکۆما مرۆ یا زیندەوارێکی ئێجگار زۆر دەڵێن، بۆ دەنگە دەنگێکی زۆریش بەکاردەبرێ.

**هەزار بە هەزار**: بڵندایی، شاخی زۆر بەرز و سەخت.*

**هەزار پرتووک** (باد.): هەزارلۆخانە.

**هەزارپا** (کە.): هەزارپێ.

**هەزارپۆپ**: کەڵەشێری پۆپەیان.*

**هەزارپێ**: (هەو.) مارەزیو، (باد.) زیف، زیڤە، پرپێ. (بار.، گەر.) دووسەرە. (هەک.) شەمار. (کە.) هەزارپا. (ئاوێ.) گەرگەدەن. (باڵە.) زیبور، زیبویی. (کە.) کێشە.

**هەزار ڕەگ**: ڕەنگاوڕەنگ. بیژوو، زۆڵ.*

**هەزاردەم**: هەزاریەک.

**هەزار فەند** (باک.): پیس، بەدزات، بەدفەڕ، بەدکار. (باک.) ـــ ی: موژی گەری، بەدفەڕی، بەدکاری.

**هەزار لۆخانە**: (باد.) هەزار پرتووک، توورەکەیەکی چکۆڵەیە بەورگی ئاژاڵانی کاوێژکەرەوەیە، کە خۆراکی دوبارە کاوێژ کرد و قووتی دا دەچێتە ناویەوە. زۆر لۆچ لۆچ و چین چینە.

**هەزاریەک**: هەزاردەم، هەزاری.

**هەزاری**: هەزاریەک، (باک.) هەزاردەم.

**هەزاز** (باک.): چاڵێکە، کە بە بروسک قووڵ بووبێ لەنێو کێواندا.

**هەزان** (باک.): نزم بوون، نەوی بوون، بهەزە.

**هەزاندن** (بام.): تێنان، تێڕاکردن.

**هەزبێ** (هەورا.): جاترە، گیایەکی تیژ و بۆنخۆشە، ژن بێ نوێژ نەبێ بیخوا بە چا، بێ نوێژ دەبێ و ئاوس دەبێ.

**هەزبیە**: گیایەکی بۆن خۆشە بۆ چێشت. نەعنا.*

**هەزبێڵە** (هەورا.): جاترەی تەڕە، کە وشک بێ پێی دەڵێن جاترە.

**هەزماز** (باک.): گیایەکە.

**هەزرۆک**: چیلکە.

**هەزوا** (هەورا.): ئەزوا، (بابا.) تاڵی شاری.

**هەزویە** (جا.): جاترە، هەزوا.

**هەژار**: بێ ماڵ، کەساد، کەساس، ژار، بەڵەنگاز، چەل، بێدار و ماڵ، بێدار، بێکەس، بێ نەوا، بێ دەق، بێ دەست. (باک.) بنسی، کزۆک، برەش، پارس، بەرڤالە، هەژێر، بایدەست، پەپووک. (هەورا.) ژار. (دهۆ.) ژارۆ. بێ باڵ، بەسەزمان، (زا.) بەڵەنگاز. ڕەش و ڕووت، بارچەوت، پێداویست، کارناساز، بارکەوتوو، گەدا، داماو، کەڕەواڵە، دەست تەنگ. نێوی پیاوانە. ئاوسەرکەم، هاوسەرکەم، دەست کورت. ـــ ی: کەسادی، کەساسی، داماوی، ژاری، (باک.) پارسەکی، زیڤاری، بایدەسی، پارس. بارڤەوتی، بێ چارەیی، کارناسازی، گەدایی، ژارۆیی، دەرکۆ دەرکۆیی، لێقەوماوی، دەرۆزەکەری، خەزانی.

**هەژان**: جوولان، بزووتن، ڕاژان، هەژین، هاژان، تەکاندان، ڕاچڵەکان، هیژان، هیژیان. ـــ ی چتی هەڵاوەسراو.

**هەژانەوە**: شەکانەوە.

**هەژاندن**: جوولاندن، بزوواندن، هاژاندن، ڕاچاندن. (باک.) ڤەوەژارتن، هیژاندن، تەکان پێدان، ڕاچڵەکاندن، وەشاندن، شەکاندن، ڕاژاندن، ڕاژەنین، ڤەوەشاندن.

**هەژاندنەوە**: شەکاندنەوە.

**هەژاڵ**: (هەورا.) پرپووچی، پژگاڵ. هەژگ و هەژاڵ، بژاڵ، هەژگ و بژاڵ، لق و پۆپی دارانە، پژی.

**هەژخوەکەر** (باک.): حەزلەخۆکەر.

**هەژدە**: دە و هەشت : ١٨.

**هەژدیا** (باک.): هەژدیها.

**هەژدیها**: (دزە.، خۆ.) هەزیا، عەزیا. (باک.) هەژدیا، ئەژدەهار. (هەو.) ئەژدەر. (دەر.) ئەژدیها. ڤشاب، هەفی، هەیفی.

**هەژقاندن** (باک.): ترساندن، تۆقاندن، بەپەلەقاژەخستن.

**هەژقین** (باک.): ترساندن.

**هەژگ**: بەپووش و پەڵاشی بێ کەڵک دەڵێن، چرپ و چاڵ، هەژاڵ، هەژگ و بژاڵ، لق و پۆپی داران، پژی.

**هەژگەڵ** (هەورا.): چرێیە، بەڵان لە چرێیە ئەستوورەکانە بەلق و پۆپەوە، هەڵاش.

**هەژگ و بژاڵ**: هەژگ و هەژاڵ، چرپ و چاڵ، بژاڵ، بژگاڵ، پووش و پەڵاش و چیلکەیە.

**هەژگ و هەژاڵ**: چرپ و چاڵ، هەژگ، هەژاڵ، بژاڵ، بژگاڵ. هەژگەلەشک. پرپووش و چیلکە، لق و پۆپی داری بڕاوە، کە گەڵاو لک و پۆپی پێوەبێ.

**هەژمار**: ئەژمار، ئەرە، ئەرۆ، شەر.

**هەژمارتن** (باک.): ئەژماردن.

**هەژماردن**: ئەژماردن.

**هەژمەت** (هەو.، دەر.): حەژمەت، تاو، ئەژمەت، پەرۆش، خەم، سوێ، تاوان. لە ـــ ان: لەتاوان، لەسوێیان؛ لە ـــ ان چم پێ نەکرا.

**هەژیان**: هەژان، هەژهان.*

**هەژێن**: جوولێن، هەژێنەر، جوولێنەر.

**هەژێنەر:** هەژین.

**هەژیر** (باد.، باک.): هەنجیر، دارا ـــ ی: دارهەنجیر.

**هەژین** (باک.): هەژان.

**هەس** (لو.، دەر.): هەیە. خەست. پاسەوان. گیایە.

**هەسار:** ئابلۆقە، دیوار.

**هەسارە** (هەو.): ئەستێرە.

**هەسارەزێڕینە:** کۆلکەزێڕینە.

**هەسارە گەلە:** کۆتان.

**هەسارە ژمار:** ئەختەرژمار.

**هەسارە ژمێر:** ئەستێرەژمێر.*

**هەسارە ناس:** ئەستێرەناس.*

**هەسارەی جووچلەدار:** ئەستێرەی کلکدار.*

**هەسارەی ڕۆژ:** ئەستێرەی ڕۆژی.

**هەساری** (هەورا.): گوڵی ئاوی، ئەستێر.

**هەسان:** سان، (کە.) ئەستان، هەستان. سەوهان. بەردێکە تیغی پێ تیژ دەکرێ.

**هەسانە:** دوو ددانی بچووکی شەویلکەی خوارەوەی بەرازییە لە بەرامبەری شفرەیە.

**هەسەرە** (هەورا.): ئێستر.

**هەسەم:** هەرەس.

**هەسپ:** ئەسپ.

**هەسپێ** (کە.): ئەسپێ.

**هەسپێون:** (هەو.) ئەسپێون.

**هەست:** خشە، چپە، چفە، چرتە، خوست، پرزە. بێ ـــ: بێ هۆش، تەزیو، بێ ـــ کردن: سڕکردن، تەزاندن.

**هەستارە** (کە.): ئەستێرە.

**هەستام** (کە.): هەسان، بەرد.

**هەستان:** هەڵستان، ڕاپەڕان، (فە.) ووسان، وورێزان. (کە.) خزان، ڕابوون، هۆرێزان. هۆرزان، هلبوون. (کە.) هەسان (بەرد). (هەورا.) هۆرستەی. هەستە: هەڵستە، ڕابە، هوولوو، هوورزە. لەبەر ـــ: چراخ لێ بوون. (هەورا.) ووڕستەی. لەخەو ـــ: (هەورا.) جە وەرم وورلە ئێستای. لە خەو هەڵستە: جە وەرم هور مەنێزە. هەڵستان، ڕاپەڕان، خزان، هەڵسان، ڕابوون، وریزان.

**هەستاندن:** هەڵساندن، ڕاپەڕاندن، هەڵستاندن، هەسانن.

**هەستە:** (ڕۆژ.، شەبە.) ئورز. (هەورا.) وورئێستە، هۆرزە، وورزە. (باک.) ئەستێ، هەڵەستە، (هەورا.) وورمەنێزە، هۆرمەنێزە.

**هەستەم** (باک.): حاستەم، سەخت.

**هەستدار:** خاوەن هەست.*

**هەستر** (کە.، باک.، دەر.): ئێستر.

**هەسترکێش** (باک.): هەسترکان. ئێستردار.

**هەستوێلک** (کە.): چتێکە وەکو ساج وایە قاوەی لەسەر دەبرژێنن.

**هەستوون** (کە.): کۆڵەکە، کۆڵەگە.

**هەست و خوست:** تەق و توق، تەقە و ڕەقە، چرپەچرپ، چپەچپ، سرتە، چفەچف، خشەخش.

**هەستی:** هەست کردن. بێ ـــ: نهێنی، لەگۆکەوتن، (هەورا.، باک.) ئێسک. ـــ یێ لوولاکی: ئێسکی لوولاکی.

**هەستیار:** بوێژ، هشدار.

**هەستێ فەگر** (باد.): شکست هەڵبەستەوە.

**هەستی گران** (فە.): تەنبەڵ، ڕەزاگران.

**هەستیف** (باک.): خاک ئەنداز، خاکەناز.

**هەستێرە:** ئەستێرە.

**هەستێوک** (باک.): جوورە هەرمێییەکە.

**هەسرەو** (هەورا.): خەسوو.

**هەسک** (باک.): ئەسکوێ.

**هەسکە:** ئانیسک، هەنیسک.*

**هەسکەهەسک:** هەسکەی زۆر.*

**هەسکۆ** (بار.، باک.): ئەسکوێی چکۆڵە، هەسکوێ.

**هەسن** (باک.): ئاسن. ـــ ی: ئاسنی.

**هەسنگەر** (باک.): ئاسنگەر. ـــ ی: ئاسنگەری.

**هەسوان** (ڕەوا.): سوونەوە، سووین.

**هەسوو** (باک.): میوە.

**هەسوورە:** خەزوور.

**هەسوون:** سوونەوەی تیغ و تیژ.

**هەسووین** (خۆ.): سوونەوەی تیغ و داسانە. سووانەوە.

**هەسوو هۆڵ:** خەست و خۆڵ.*

**هەسێ:** هەستی، هەست کردن، بوون.

**هەسێڵ:** چالاو.

**هەش** (باک.): فیتوو، فیتوولێدان.

**هەشارگە** (فە.): حەشارگە. ـــ ی ڕاووشەڕی: سیپ، سپێر. ـــ ی ڕاوکەران: (کۆ.) جێگای شت و خۆلێ شاردنەوە. (پژ.) مەکۆ. پەنا.

**هەشاندن** (باک.): ئاخنینەوە، پڕکردن.

**هەشە** (هەورا.): ورچ. جووڵێنراو.

**هەشەری** (باک.): ڕاوەشاندراو.

**هەشپش** (زەن.): ئەسپێ، مۆریانە. (هەورا.) هەشپشی.

**هەشت:** ٨، چوار و چوار. سێ و پێنج.*

**هەشتا:** ٨٠، هەشت جار دە.

**هەشتا:** ٨٠، هەشت جار دە.

**هەشتاڵوو** (هەورا.): خۆخ، قەرەڵوو، هەشتاوی.

**هەشتاو:** (خۆ.، هەو.) پەلە، تاڵووکە. بە ـــ: بەپەلە. ـــ ی (هەورا.) قەرەڵوو، هەشتاڵوو. (هەورا.) ـــ ی: خۆخ. (هەو.) بەخێرایی، بەکت و پڕی.

**هەشتە** (باک.): هەشتا.

**هەشتەک** (باک.): مارەیی.

**هەشتەم**: ئەوەی لە ژمارەدا بەر هەشت دەکەوێت.*

**هەشتەمین**: ئەوەی لە ژمارەدا بەر هەشتەم دەکەوێت.*

**هەشتر** (باک.): ووشتر.

**هەشتیەک**: مارەیی، ئەو بەشەیە، کە ژنی بەرەلاّ کراو یا مێرد مردوو لە ماڵی مێردی دەگرێ.

**هەشفاندن** (باک.): خەت بەسەرکێشان، کوژاندنەوە.

**هەشفین** (باک.): کوژانەوە.

**هەشنبۆز** (باک.): بۆز (بۆ ولاّخییە).

**هەشو** (باک.): کۆما مووی هەڵکەندراوو ڕنراوە.

**هەشین** (باک.): شین.

**هەشیناتی** (باک.): سەبزی، شینایی.

**هەشینانی** (باک.): شین.

**هەشینۆک** (باک.): سووریژە.

**هەف** (باک.): کەمینگا، تەڵە، فاقە.

**هەفان** (باک.): ماندووبوون، بەهەفە.

**هەفاندن** (باک.): ماندووکردن، بەسەختی ماندووکردن.

**هەفاو** (باک.): کێشکچی، پاسەوان.

**هەفبەند** (سو.): ئاوێتە، تێکەلاّو.

**هەفت**: حەوت، حەفت، هەوت.

**هەفتاک** (باک.): پشتێندی زۆر درێژ.

**هەفتە** (باک.): هەوی، هەوتە، حەفتە. ــ یی: هەوتەیی.

**هەفتەو** (فە.): ئافتاوە.

**هەفتجار** (باک.): بۆق.

**هەفترەنگ** (باک.): قوماشی ئاوریشمی ڕێ ڕێ. خاڵ خاڵ (بۆ ئاژاڵانە).

**هەفت لۆ**: حەوتوویلکە، (موک.) کوانێکە تا حەوت تویلکان ناوێ چاک نابێتەوە، لە باسک یاڕانی دێ بەقەدەر سێوێکی دەبێ و نێرتکی هەیە.

**هەفتم** (دەر.): هەڵکردنی گوریس و ئیترە.

**هەفتیار** (باک.): کەمتیار.

**هەفتێ** (باک.): حەفتا، ٧٠.

**هەفتێنی** (دەر.): پەیینکە.

**هەفسار** (باک.): هەوسار.

**هەفسۆدان** (باک.): گیایەکە.

**هەفسی** (باک.): مۆلگەی ولاّخانە.

**هەفقاس** (باک.): هێندەی.

**هەفک** (باک.): بۆڕی هەوا، قوڕقوڕچکە.

**هەفی** (کە.): هەژدیها.

**هەڤ** (باک.): هەموو، یەکتر، پێکەوە. بەهەڤرە: پێکەوە. ژــ بوون: لەسەر هەڤ: لەسەر یەکتری، بەدەستە.

**هەڤا** (باک.): هاوکار، بەشدار، هەڤپا، هامپا.

**هەڤاڤ** (باک.): دانیشتووی کەنار چۆم و ئاوان.

**هەڤاڵ** (باک.): هاواڵ، برادەر، یار، دۆست. (باد.) هڤاڵ.

**هەڤاڵ بەند** (باک.): یەک گرتوو. ــ ان: یەک گرتووەکان. ــ ی (باک.): یەکێتی.

**هەڤالجەو** (باک.): هەڤالجیوک، دوانە، جمک.

**هەڤالجیوک** (باک.): جمک، دوانە.

**هەڤالدار** (باک.): لاگر. (باک.) ــ ی: لاگری، هاولاّیەتی.

**هەڤالز** (باک.): جمک، هەڤالجیوک، دوانە.

**هەڤاڵزا**: جمک، دوانە.

**هەڤالزاڤا** (باک.): ئاواڵ زاوا.

**هەڤالکار** (باک.): هاوکار لە نووسیندا.

**هەڤالکراس** (باک.): ئاواڵکراس.

**هەڤاڵی** (باک.): هاوالاّیەتی، دۆستایەتی، برادەرایەتی.

**هەڤاڵێ** (باک.): گۆرانی بووکانە.

**هەڤان** (باک.): تەڵەکەباز، تەشقەڵەباز. بلوێر، خورج، هەگبە.

**هەڤانی** (باک.): هەڤانوو، تەشقەڵەبازی، تەڵەکەبازی، دەسیسە، دووزمانی، پیلان، بەدفەڕی.

**هەڤانی کرن**: بەدفەڕی کردن. تەشقەڵەکردن*

**هەڤای** (باک.): هاوکار، خاوەندی گۆل یا گۆم. (باک.) ــ یی هاوکاری.

**هەڤدوایێ** (باک.): ڕێک و پێک خستن، وێچوواندن و پێک گرتن.

**هەڤەر** (باک.): بزنی ڕەش و سپییە.

**هەڤبا**: ئامبا.

**هەڤبەر** (باک.): بەرامبەر، تەنگاڵ، بەردیلک، بەزل.

**هەڤبەردا** (باک.): وێچوو، هاوتا.

**هەڤبەری** (باک.): بەرامبەری، وەکو یەکتری، وێچوویی، هاوتایی.

**هەڤبەهرە** (باک.): هاوکار.

**هەڤپا** (باک.): هەڤا، بەشدار، هاوکار، کاربرا. (باک.) ــ یی: بەشداری، هاوکاری، کاربرایی.

**هەڤپار** (باد.): هەڤبەش، هاوبەش.

**هەڤ پیشە** (باک.): هاوکار، هاوپیشە.

**هەڤناڤ** (باک.): هاونێو، هاوناو.

**هەڤتۆنە** (باک.): وەکو، هەروەکو.

**هەڤنێر** (باک.): هاوتا، هاونیر.

**هەڤجار** (باک.): قۆچەقانی.

**هەڤجڤان** (باک.): ئەنجوومەن. (باک.) ــ دن: ئەنجوومەن بەستن، کۆکردنەوە.

**هەڤچووم** (باک.): دەمەقاڵە، شەڕ بە دەمەقاڵە و بە هەراهەرا.

**هەڤدا** (باک.): هەردا.

**هەڤدار** (باک.): هەوداڵ.

**هەڤداک** (باک.): موو، تووک.

**هەڤداڵ** (باک.): هیلمێکی شل و شینە لەسەر لکی داران.

**هەڤدان** (باک.): کۆبوونەوە، یەکبوون، یەکگرتن. (باک.) ـــ ی: یەکێتی.

**هەڤدە** (باک.): حەڤدە.

**هەڤدەم** (باک.): هاودەم.

**هەڤدەنگ** (باک.): هاودەنگ.

**هەڤدل** (باک.): هاودڵ، یەک گرتن. (باک.) ـ ی: هاودڵی، یەکێتی.

**هەڤرات** (باک.): وێچوو. ـ ی: وێچوون.

**هەڤراز** (باک.): هەوراز، بڵند.

**هەڤراکی** (باک.): بناری، هەتەری.*

**هەڤرەنگ** (باک.): هاوڕەنگ. (باک.) ـ ی: هاوڕەنگی.

**هەڤرە** (باک.): هاوڕێ.

**هەڤرمیش** (باک.): ئاوریشم.

**هەڤرک** (باک.): بنار، هەتەر.

**هەڤرنک** (باک.): کەنار ئاوی پڕ دار و درەخت.

**هەڤرنگ** (باک.): برینگ، مقەستی ئاژاڵ بڕینەوە.

**هەڤروو** (باک.): هاوتا.

**هەڤرووشک** (باک.): هەرمیشک.

**هەڤری** (باک.): وەکو، وەک، تەق. هاوتایی.

**هەڤریتی** (باک.): هاوتایی.

**هەڤرێز** (باک.): جوورە عەرعەرێکە.

**هەڤریست** (باک.): هێرڤست، عەرعەر.

**هەڤریش** (باک.): نانی سوورکراوەوەیە لە ڕۆنیدا و شەکریشی پێوەردەکرێ. کولیچەی بەشەکری.

**هەڤریشم** (باک.): ئاوریشم.

**هەڤرویش** (باد.): ئاوریش.

**هەڤرووشک** (باک.): جوورە شیرینایتێکە.

**هەڤرووشم** (باک.): ئاوریشم. (باک.) ـ ی: ئاوریشمی.

**هەڤڕی** (باک.): برادەر، هاواڵ.

**هەڤزمان** (باک.): هاوزمان.

**هەڤسەر** (باک.): هاوتا، هەڤبەر، بەردیلک.

**هەڤشی** (باک.): مێگەلە بەرخێک.

**هەڤشیر** (باک.): ئاژاڵێکە بە شیری دایکی خۆی بژی.

**هەڤگەڵ** (باک.): پشتیوان، پاڵەپشت. (باک.) ـــ ی: یارمەتیدان، یارمەتیکردن.

**هەڤل** (باک.): هێز، تین، هێرش.

**هەڤووراندن**: فراوان کردن، گوشادکردن.

**هەڤووتن** (شیر.): فڕکردن. نەهەڤووتی: فڕنەکراو.

**هەڤۆ** (باک.): کەرکێن، نێریەکێوی.

**هەڤۆک** (باک.): گەلەوتە، کۆ، کۆما.

**هاڤوودار** (باک.): هەڤداڵ.

**هەڤووری** (باک.): تشتر، نێری دووساڵانەیە.

**هەڤوورین** (باک.): گورش بوون، فراوان بوون.

**هەڤی** (باڵ.): مانگ.

**هەڤیاز** (باک.): جوداکردنەوە، چیترگرتن.

**هەڤیر** (باک.): هەویر.

**هەڤیرترش** (باک.): هەویرترش.

**هەڤیری** (باک.): وەکو هەویری. نان ـــ: نانێکە نەبرژابێ وەکو هەویربێ.

**هەڤیساندن** (باک.): فێرکردن. بهەڤیسینە.

**هەڤیسین** (باک.): فێربوون.

**هەڤین** (باک.، باد.): خۆشەویست. (باک.) ـ ی: خۆشەویستی.

**هەڤێن**: هەوێن.

**هەقە** (باک.): تیکوڵی هێلکەیە.

**هەقەتێ** (کە.): ئەستوور.

**هەک** (ڕۆژ.): قسڵ. ئەگەر. (موک.) دەک. ـ ماڵت بە قوڕ گیرێ.

**هەکە** (باد.): ئەگە، (باک.) ئەگەر.

**هەکردن**: بەرەلاکردنی مالاتان.

**هەکۆ**: نێوی پیاوانە.

**هەگە**: مەرج.

**هەگەر** (باک.): ئەگەر. (باک.) ـ چی: ئەگەرچی.

**هەگبەز**: خورج، خورجین، پاشکۆ، هەپان، هەوان.

**هەل**: کژ، دەرفەت، هەڵکەوت، جار، چەل، نۆبە، کەڕەت، چاخ، حەل، دەم، کات، چەخش. (باک.) هۆڵی مەڕانە.

**هەڵ**: بەرز، بڵند، هەوا. (بەلاّن بەتەنێ بەکار نابرێ). ـــ گرتن: هەڵاوێژتن. (ڕۆژ.) هەڵەشە. خۆپەسندکار.

**هەلا** (خۆ.): وەلا. ـ کەوتن: وەلاکەوتن، لاچوون، لادان.

**هەڵا**: ئاها، هاها، تەح، تەحا، پەح، پەحا. هەرا، کێشە. (ڕۆژ.) ـــ گرتن: هەڵپەڕین، هەڵپەرکێ. (موک.) بۆ واقمانە.

**هەڵات**: یەکێکی نەدیو ڕابکا، غاریدا. (ڕۆژ.) ڕۆژهەڵات. (بابا.، کە.) درۆ، درۆ لە خۆوە ڕێکخستن. ڕۆژ ـــ ن: خۆرهەڵاتن، ڕوونا‌ک بوون، تاوهەڵاتن.

**هەڵاتە** (کە.): هەڵاتوو؛ هەویرەکە هەڵاتەیە: هەویرەکە هەڵاتووە.

**هەڵاتگە**: برزە، ڕێگەی ڕزگاری و دەربازبوون.

**هەڵاتنگە**: شوێنی هەڵاتن.

**هەڵاتن**: هەڵهاتن، هلەهاتن، هلاتن. ڕاکردن، ڕەمکردن، تاربوون، تەورین، تەقین، فیرارکردن، واین، شکان، پشت وەرگێران، پشت کردنەوە. (باک.) پەکین، پشت دان. ـــ ی مانگ و ڕۆژ و ئەستێران:

دەرکەوتنیان یا دیار بوونیان، وراتن، درەوشانەوەیان. لە ناو ـــ: تەڕبوون، مەلەکردن و خۆشوشتن.

**هەڵاتوو** (کە.، ڕۆژ.): ڕەمنە، فراری، تەقیو، هەڵهاتوو، هەویری ـــ: هەڵاتە.

**هەلاج**: پەڕەکەر، ـــ ی: پەڕەکەری. کەمانژەن.

**هەلاجی کردن**: گوورنیک.

**هەلانۆشە**: جوورە جۆلانەیەکە. (شن.) جیللەنە جوقە.

**هەلاخزان**: ئاخزانەوە، پەسترانەوە، داپەستران.

**هەڵاخزاو**: خزاوەوە، داپەستراوەوە، پەستراوە.

**هەڵاخنین**: ئاخنینەوە، پەستاوتنەوە، داپەستاوتن.

**هەڵاززاو**: هەڵپشکووتوو.

**هەڵاززان**: هەڵپشکوتنی زار و لێو لەبەر تایە.

**هەڵاژیان**: ڕاکشان، هەلاژین، خۆ درێژکردن لەسەر لا بۆ نووستن.*

**هەڵاش**: لق و پۆپی داران بەگەڵاوە، چێژی. ئالاش، کەوشە، گەررەشک، پەردوو، هەژگ و هەژاڵ. وەڵەکە: وردەوەڵ. ئەو گژ و گیاو لق و پۆپانەیە کە دوای دارەڕای خانوان دەخرێتە سەری و ئەوجار قوڕەبان و گڵەبان دەکرێ.

**هەلاکۆ** (خۆ.): لاکەوە، لاچۆ، هەلاکەوە.

**هەڵاکوو** (کورد.): قیزبەلە.

**هەلال** (باک.): دارێکە.

**هەڵاڵ**: گوڵێکی بەهارییە، هەڵاڵە. ـــ کردنی پێستان.

**هەڵاڵە**: هەلاڵ، گوڵێکی زەرد و بۆنخۆشی بەهارییە و لە تەڕازنان دەبی. گولێکی زەردی مەیلە و بۆرە بۆنی خۆشی بەهارییە لە مێرگان دەبی و درویست بڵند دەبێ.

**هەڵاڵەبرایە**: (موک.، شا.) شلێر. جوورە گوڵێکە لەسەر گۆڕان دەچێنرێ.

**هەلالک** (باک.): بەلاڵووکی کێوی.

**هەڵالووک** (زێ.): بەلاڵووک (کێوییە)، بۆ ڕەوانی باشە.

**هەلامە**: گیای دژکلێوە بۆ چێشت بەکاردێت.*

**هەلامەت** (ئامێ.): تارمایی، ئەوەی لەناو باخچە و شینایییان باڵندەی پێ دەترسێنن.

**هەڵامەت**: درم، (هەو.، ڕەوا.) پەسیو، پەتا، باهۆڕ، ئارسم، پەرسیف. پەسیوی، باهۆڕی، دەمەنی، (زرا.) فرفینک. (سو.) پەرسیو، (ڕۆژ.) تماو. (جا.، سزیر.) دەمەنی. مرک. (باک.) ساف. ـــ ی مالاتان: سقاو.

**هەڵامەتدار**: (باک.) ئارسمی، پەسیودار، بەپەسیو.

**هەڵامسان**: ئەستووربوون. (هەو.) پەنمان، ئاوسان. هەڵمسان. (هەورا.) ماسان. (باک.) بەل بوون، پووم، پژبوون، چکووراندن. هەر پەرچفتن، هەوکردن، پەنمین، هەر پەرچوون.

**هەڵامساندن**: وەرماندن. (باک.) بەل کردن، پژکردن. پەرچڤاندن.

**هەڵامساو**: ئاماسیاو، پەنماو، وەرم. دێمگر: هەمەم.

**هەلان** (باک.): کۆمایەک تەختەبەرد.

**هەڵانۆش**: حندرحۆ، گەمەیەکی مندالانە.

**هەڵانگران**: دەوڵەمەندبوون، بەهەوابوون، یاغی و غرەبوون.

**هەلانن** (باک.): رفاندن.

**هەلاو**: هەراو. گیایەکە لکی هێندێک ئەستوور و گەڵای وەنی ئەسپینداری دەچی گەزێک بڵند دەبێ. گیایەکە ئاژاڵ بیخوا پێی دەمری. دەردێکە لە گەرووی ڕەشەوڵاخی پەیدا دەبی و دەیکوژی. ـــ یەتی، ـــ ی هێناوە. هالاوی ئاوری، هەڵمی ئاوری.

**هەلاواردن**: (فە.) هەلاوێردن، لێک جوێ کردنەوە. دابڕان، دابڕین، هاوێرکردن، ئاوارتن، چەرت کردن.

**هەلاوە** (هەورا.): چاو.

**هەڵاوەسران**: (جا.) ئاوێزان.

**هەڵاوەسراو**: (باک.) پێدار.

**هەلاوەسین**: هەڵواسین، هەڵواستن، هەڵویسین، هلاوەستن، دالقاندن، ئاوێزان کردن، تێ ئالقاندن، بەدار داکردن، بدار ڤاکرن، دران. خۆ ـــ: دالقین، تێ ئالقان. پێداهەڵاوەسین: وێخستن، پێداکردن.

**هەڵاوبگر**: کێشەکێش.

**هەلاوچی** (باک.): هەڵواچی.

**هەلاوفرۆش** (باک.): هەڵوافرۆش.

**هەلاوگێڕ** (کە.): وەرگێڕراو، بەرووپشت کراو، ئەم دیوەودیوکراو.

**هەلاوهەڵێ**: یاریەکە دووکەس دەبنە سەرپشک بۆ دوو (بەرە) وەپاشان یاریکاران خۆیان نامزەد دەکەن دوو دوو خۆیان دێنە پێشەوە بەوە دەڵێن (هەلاوهەڵێ).

**هەڵاوێردران**: دابڕان، دابڕدران.

**هەڵاوێردراو**: دابڕاو.*

**هەلاوێژتن**: هەڵدان، دیونای، هلاڤتین، هێلاڤێتن. خۆ ـــ. لێدان، هەڵبزووتان.

**هەلاهەلا**: پارچەپارچە، وردوخاش، شڕ و وڕ، تووڵانەوە، حەلا. ـــ بوون، ـــ کردن: ڕزین، داپلوخان، وردبوون، وردوخاش بوون، تواندنەوە، پارچەپارچەبوون، ئەنجران، ئەنجنین، ڕزاندن.

**هەللاّ**: بڕوانە: هەڵلا هەڵلا.

**هەڵلا هەڵلا، هەڵاهەلا**: کێشەکێش، قرەقڕ، دەنگەدەنگ، کوتەکوت.

**هەلای** (هەورا.): هێشتا.

**هەڵایسان**: داگیرسان، هەڵگیرسان، گژگژین، داگیرسانی چرا و ئاور، بەرپابوونی شەڕوکێشە. شەڕ ـــ.

**هەڵایساندن**: داگیرساندن، بەرپاکردنی شەڕوکێشە، گژگژاندن، ئاورهەڵکردن، شەڕ ـــ.

**هەڵایساندنەوە**: ژیاندنەوە و زیندووکردنەوەی شەڕوکێشە.

**هەڵایساو**: داگیرساو، داگیراو، ئایساو.

**هەڵە** (دزە.): چەوتی، تالووکە، پەلە، جەخت، تارومار، خویژنک. پێ لە ـــ نان: دان بەهەڵەدانان. بە ـــ چوون: بەسەرچوون، ئاوارە، هەتک.

**هەڵەبجە**: شارۆچکەیەکە لە دەشتی شارەزوور.

**هەڵەبوون** (دزە.): هەترەوئاوارەبوون. گەورەبوونی نێو لوولەی تفەنگییە.

**هەڵەپاس** (دزە.): هەڵەباز، زۆربڵێ، بێشەرم، چەنەباز، هەڵەوەڕ.

**هەڵپەزە** (موک.): بڵقەدەرە.

**هەڵەت** (کە.): زورک. زەوییەکە زۆرگرد و تەپۆڵکە یا بڵندونزمی تێدابی. هەڵە.

**هەڵەتاو**: کێوێتی.

**هەڵەتە** (هەورا.، هەو.): هەترە، دەربەدەر، ئاوارە.

**هەڵەدو** (دزە.): پەلە. بە ـــ ی: بەپەلە.

**هەڵەدوان** (هەورا.): بە سەختی و سەر لێ شێواوی، بەپەلە و سەرلێ شێواوی. شڵەژاوی.

**هەڵەز** (باک.): گیایەکە.

**هەڵەزار** (دزە.): کاڵ، کاڵک.

**هەڵەژە** (بۆڵ.): چیمەنێکی بن فشە، کە پێی لێنرێ نەوی و بەرز بێتەوە.

**هەڵەسۆر** (باک.): جوورە ترێیەکە، گوڵی گوڵاوی، گوڵی سوور. (موک.) خۆشرۆ.

**هەڵەشە** (هەورا.، کە.): لەنیشانەدەر، نیشانە ئەنگێو. پیاوی عاقل سووک یا کاری بێ ڕێ و جێ. خۆپەسند، هەل. (باک.) بەترەف. (سل.) هەڵمەتەکاسە. تەرەدین.

**هەڵەشەیی**: خێرایی، شڵەژاوی، کوێرانە، بەهاش و هوش، هەراوهۆریا.

**هەڵەش هەڵەش**: چتێکە لەسەر زەوی بلەقی و لەقەلەقێ بکات.

**هەڵەق** (بابا.، کە.): ـــ کردن: بەستنی ڕێگای ڕەشمەلاخانە بەدارێکی درێژ بەپانی دەرگانەوە.

**هەڵەکار**: بەپەلە کارکەر، شێوەبزرکەر، ناڕشت، چەوت. ـــ ی: بەپەلەپەل کارکردن، شێوەبزرکردن، کاری ناڕاست و چەوت لەهەڵەدایە.

**هەڵەکارین**: ڕەچەڵەک.

**هەڵەکە**: سەما.

**هەڵەگ** (کە.): هێڵەگ.

**هەڵەلەلە**: حەلەلەلە: هۆیها، دژیها، لەکاتی شەڕەسەگی یا سەگ لە گورگ بەردانیدا بەکاردەبرێ.

**هەڵەم** (کۆ.): هەرێم.

**هەڵەم** (باک.، بوتا.): تۆقەسەری هەر چتێکی بڵند بێ وەکو هی چیا و ئیتر.

**هەڵەمار** (باد.): شارەمار، شوێنێکە، کە ماری زۆر بێ.

**هەڵەنگواندن**: تێک ـــ: لکواندن.

**هەڵەنگوتن**: هەڵەنگرفتن، هەڵقۆچان، تەسمە. (هەو.) نسکۆبردن، ساتمەکردن. تێ ـــ: هنگڤین. تێک ـــ: تووشی یەکتربوون، یەکتردیتن، (باک.) پەرگی بوون. لکومین.

**هەڵەوەڕ**: هەڵەپاس، زۆربڵێ، زۆر وەڕ، خۆتێ هەڵقوتێن.

**هەڵەوگەر**: ناوەژوو.

**هەڵەهەڵ** (کە.): پەلەپەل، لەخۆ قایل بوون.

**هەڵبەت**: هەلبەتە، ئەلبەت.

**هەڵبەز**: چڤ. خۆ بە هەوا دادان بەرەوژوور. *

**هەڵبەزان**: بڕوانە: هەڵبەزین. *

**هەڵبەزاندن**: (باک.) پەڕچاندن.

**هەڵبەزهەڵبەز**: لۆک.

**هەڵبەزین**: هەڵواسین، چرت کردن. (باک.) چڤ لخوەدان، بەلقاندن، چرت کردن، تەولباز لخوەدان، بەبین، بلۆک چوون. هەڵقەمواستن.

**هەڵبەزینەوە**: هەڵتۆقینەوە، چریک. (باک.) بەهین، چرت کردن، چریقیت، چرین، فتلۆپاچک، لۆدک، لۆتکین.

**هەڵبەست**: هۆنراوە، هۆزان، شیعر. (باک.) دوورێزان. ـــ ڕێکخستن: هۆنراوەدانان. بە ـــ لە خراپەی کەسێکی دوان: هەجو. درۆ، ساختە.

**هەڵبەستە**: بوختان.

**هەڵبەستەر**: بوێژ، ساختەکار. شکا و هەڵبەستەوە.

**هەڵبەسترو**: توند و قایم کراو. قسەی سەربەخۆ. ریشووی بادراو. *

**هەڵبەستن**: داهێنان، دامەزراندن، دانان، دۆزینەوە. جۆگە ـــ. کاڵە ـــ.

**هەڵبەستنەوە**: ـــ ی شکاو، ـــ ی جۆگەی شکاو.

**هەڵبەل** (باک.): ناهومێدی، واز لە هەوڵ و تەقەلاهێنان.

**هەڵبڕ**: لێک هەڵبڕان.

**هەڵبڕان**: هەڵدڕان، بڕان، لێک دوورکەوتنەوە، جوێ بوونەوە، لێک بڕان.

**هەڵبڕاندن**: هەڵدڕاندن، هەڵدڕین.

**هەڵبڕسکان**: بڕکانەوە، بڕسکانی شیر، هەڵگەڕانی شیر.

**هەڵبرکان** (ڕۆژ.): هەڵبرینگان (بۆ هەور و بارانە). هەڵگەڕان (بۆ شیرو ماست). هەڵبڕسکان.

**هەڵبڕین**: چاو هەڵێنان، هەڵدڕین، تاونان، ڕاونان، سەرلەدوونان. پێ لێ ـــ: سنوورشکاندن، سەرپێچی کردن. چاو ـــ: چاوبڵندکردن. سەر ـــ: سەربڵندکردن. چەرم ـــ: چەرم هەڵدڕین. بڵندکردن، (هەو.) ڕەپێ نان، ڕاونان. (کە.) شکاندنی دوژمن.

**هەڵبرینگان**: هەڵبرکان. (هەو.) کژکردن.

**هەڵبرینگاندن**: هەور و بارانە و هەلا لاچوون. لێکردنەوە، هەڵبرکان، باران وەشاندنەوە. (موک.) کەژکردن. (هەورا.) هورش و برینگان.

**هەڵبزرکان**: (هەو.) هەڵبرکان. (کە.) هەڵبزورکان. (دەر.) هەڵبرکیان. بزرکان، هەڵپرووکان، هەڵگەڕانی شیری، هەڵبرسکان.

**هەڵبزرکاو**: شیری خراپ بوو.

**هەڵبزوورکان** (کە.): هەڵبزرکان.

**هەڵبزووقان** (شا.): ژنی ئاوس، کە زۆر ماندوو بێ. منداڵەکەی هەڵدەبزوقێ: دەبزوێ. بۆ تۆپ و چتێکی دیکەش بەکاردێ، کەیەک یا چەند جارێک هەڵبەزیتەوە، هەلاڕێژتن، لێدان.

**هەڵبژاراو**: هەلبژێراو.

**هەڵبژاردە**: بژارە، بژاردە، دانستە، ووژانە.

**هەڵبژاردن**: لێبژاردن، لێگرتن، ووژاندن، لێبژارتن، لێژماردن، بژاردن، هەڵژماردن.

**هەڵبژاندن**: دیارکردن، هەڵبژاردن.

**هەڵبژێرو**: هەڵبژاردراو، بژاردە، ژماردە، ئەژماردە، (باک.) بژارتو، هەڵبژاردە.

**هەڵبژێر**: دەنگ دەر.

**هەڵبزێراو:** هەڵبژارراو.

**هەڵبواردن:** بەسەرچوون.

**هەڵبوون:** داگیرسان، داگرتن، داگیران. چرا ـــ: پێکردنی چرا.

**هەڵبوێر:** لە بیرخۆبەرەوە، چاولێپۆش.

**هەڵپاچان:** هەڵپاچران، قرپان. گیایێکە وەکو قجیلە بەعەردیدا پان دەبێتەوە، چەند لقێکی ئەژنۆیەک بڵند دەبێ، گەڵاکانی و رەنگی تیژیکی گەڵای شوتییە. هەڵپەچان: لەسەرەوەی لقە گچکەکان گولێکی سووری وەکو خوێنی دێنێ ناوەندی رەشە، گوڵەکەی وەکولیلکی نیسانی دەچی.

**هەڵپاچەر:** هەڵپاچین، ئەوکەسەیە هەڵدەپاچی.

**هەڵپاچین:** هەڵپاچەر، هەڵقاچین. (رۆژ.) پاچین، پاچینەوە، هەڵقاچین، قرپاندن. بەدوارد ریش یا سمێڵ یا چتێکی دی هەڵپاچین.

**هەڵپە** (کە.): هەوڵ، تەقەلا. (هەو.، دزە.) قسەی بێ کەڵک. (موک.) تاسەی زۆر، پەلە، تالووکە.

**هەڵپەر:** (باک.) پیلیتەڤان. کەسێکە هەڵپەڕێ.

**هەڵپەراندن:** لەرزاندن، لەیزاندن، سەماپێکردن، شایی پێکردن.

**هەڵپەرتاوتن:** هەڵپەرداوتن، قەدکردن، قەرتارندن، بەچاوەوەکردن، بەچاور زاری پیسەوە کردن. لە بەهاراندا سەرلقی داران دەبڕن تا بەهێزتر بێت.

**هەڵپەردان:** قۆڵین.

**هەڵپەرداوتن:** هەڵپەرتاوتن، پەلکردن، قەڵتکردن، قەڵت و برکردن.

**هەڵپەرست:** هەلخواز.

**هەڵپەرکێ:** داوەت، شایی، هەڵپەرین.

**هەڵپەرگە:** شوێنی هەڵپەرین، گۆرەپانی شایی کردن.

**هەڵپەرۆک:** ئەزم و جوورە هەڵپەرینێکە.

**هەڵپەرین:** (دا.، زەن.) زنجکردن.

**هەڵپەرین:** (کە.) هەلاگرتن، داوەت کردن، شایی، زەماوەند، لەزین، هەلا، چووزەکێ، هەڵپەرکێ، ئاموودی، دیلان، هۆرپەرای. جوورەکانی ئەمانەن: سەما، چۆپی، رۆنیە، سێسکەیی، لەنجە، شێخانی، لار، ناز، سۆرانی، بەهار، سێپێ یی، شکاکی، ئاسکانی، کەویار، رەوەندی، زازایی، شادی، موکری.

**هەڵپەژنین:** هەڵپەرداوتنی لق و پۆپی نارێکی داران تا بەژنی راست و رێک هەڵچێ.

**هەڵپەساردران:** بە چتێکەوە پاڵ دران*

**هەڵپەساردن:** پەساردن، هلپەسارتن، چتێکە بەدیوار یا جێگایەکی بڵندەوە.

**هەڵپەندمان:** هەڵپەغان.

**هەڵپەنمان** (کە.): (کۆ.) هەڵپەندمان، هەڵتۆقان، هەڵتۆقین، هەلاًمسان. لەخەو بێدار بوونەوە.

**هەڵپەهەڵپ** (هەو.): زۆر بڵێیی، چەنەبازی، وتەی زۆر و بێ کەڵک، چەنەچەن.

**هەڵپچەران:** هەڵپچران. ـــ دن: هەڵپچراندن.

**هەڵپچەراو:** (کە.) هەڵپچراو.

**هەڵپرژان:** ـــ ی ئاو، ـــ ی فرمێسک. پێک هەڵپرژان: بەرەنگاری یەک بوون، دەست ناقتن هەڤ. پێک ـــ: زۆرانی گرتن.

**هەڵپروان:** پروان، پرووکان.

**هەڵپرواندن:** پروان، پرووکاندن، ولێن.

**هەڵپرووزان:** پرووزان، تووک و خوری و ئیتر، کە کەمێک ئاگر بیسووتێنێ. ـــ دن: پرووزاندن.

**هەڵپرووکان** (هەو.): هەڵبزرکانی شیر و دۆ. ـــ ی هەویر: ترشان. (موک.) هەڵوەرینی چتێکییە لە گەرمان. پسانی دەمار یا ریخۆڵە. هەڵپچەرین.

**هەڵپزاو:** (کەل.) هەلاًمساو، ترشاو.

**هەڵپسان:** قووتسان. بران. ـــ دن: قووتساندن، ـــ ی گوڵ و گیا و ئیتر.

**هەڵپشفتن:** هەڵپشاوتن.

**هەڵپشاوتن:** پشاوتن، هەڵپشافتن، هەڵگلۆفتن، (باک.) پشافتن، جەمجقاندن. (هەورا.) شڵەپاندن. چاو ـــ: چاوکووشین، هەڵگلۆفتن. پشکاوتن، پشکووتینەوە، درووومان هەڵوەشاندن.

**هەڵپشکووتن:** هەلاًزران، هەڵدەپشکوێ، ـــ ی دەم ولێو دوای نۆبە تێ، نۆبە تا.

**هەڵپشکووتوو:** هەلاًزراو.

**هەڵپشێوران:** جەمجقین.

**هەڵپلان** (زەن.): وەرگەران.

**هەڵپێچان:** بەستنەوە، توندکردن.

**هەڵپێچران:** پێچانەوە، ـــ ی دۆڵمە.

**هەڵپێکان:** داخستن، بەسەر یەکدا جووتکردن.*

**هەڵتەکاندن:** هەڵوەشاندن، تەکاندن، بەباکردن. ـــ ی جل و بەرگ و ئیتر. چاو و برۆ ـــ. (رۆژ.) هەڵوەشان (بۆ درووومان و دیوار). راوەشاندن.

**هەڵتەکاو:** (هەو.) هەڵوەشاو (دیوار و درووومان).

**هەڵتەک هەڵتەک:** هەلینگدان.

**هەڵتەکین:** چاو یا برۆ هەڵتەکان.

**هەڵترانن:** دەرکردن، وەلابردن.

**هەڵترە:** برۆ، لاچۆ، برۆ دەرەوە.

**هەڵترەقین:** تۆقین، لەداخان پسان، ئاوس بوون.

**هەڵترشان:** هەڵکفان.

**هەڵترووشکان:** لەسەر چینچکان دانیشتن، لەسەر چیچکان، هەڵچینکان، هەڵتوترەقان، هەڵتۆترەقان. ـــ ی سەگ و ئیتر: هەڵکووچان.

**هەڵترین** (کە.): رق هەستان، برۆ وەترە، چیت لە دەست دێ بیکە.

**هەڵتلیشان:** دادران. ـــ دن: دادرین.

**هەڵتۆترەقان:** هەڵترووشکان.

**هەڵتورشکان** (کە.): مانگرتنی کەر. هەڵترووشکان.

**هەڵتۆقان:** هەڵتۆقین.

**هەڵتۆقین:** هەڵپەڤان، هەڵپەڤاندن. (باک.) تۆلەقاسک. هەڵبەزینەوە. تۆقین، هاتنەدەرەوەی کارگ.

**هەڵتیزان** (کە.): مانگرتنی کەری.

**هەڵچ** (هەورا.): کارگ.

**هەڵچەپاندن** (کە.): هەڵچنین، لەسەریەک کۆمەڵ کردنی کالاّ و قوماش.

**هەڵچەرخان:** وەرسووڕان.

**هەڵچەرخاندن:** وەرسووڕاندن.*

**هەڵچەرخیان:** هەڵچەرخان.

**هەڵچەقاندن:** تێ ــ: تێڕاکردن، تێڕوکردن.

**هەڵچنران:** چێشتی شل، کە زۆر بکوڵێ و ئاوەکەی نامێنێ. هەڵدەچنرێ: نامێنێ.

**هەڵچنحیان** (ڕۆژ.): گەڕانەوە.

**هەڵچنین:** مڕین، ڕەپێ نان، قەلاّپەچن کردن. کار ــ: گەیاندە دوایی و تەواوکردن. ــ ی دیوار: بڵندکردن، لەسەریەک دانان، کۆمەڵ کردن، هەڵچەپاندن، تەنگەتاوکردن.

**هەڵچۆڕان:** چک بوون، چۆڕانەوە، وشان. ــ دن: ووشین، چۆڕاندنەوە.

**هەڵچۆڕاو:** دڵۆپاو.

**هەڵچوون:** ڕوان (بۆگیا)، ــ ی چێشت: زۆر کولاّن. (هەورا.) هۆرشین. پەروازە. بەدار ــ: بەدار هەڵگەڕان. پێ ــ: پێداچوون، درێژەپێدان. گەورەبوون (بۆمنداڵ و باڵدارو ئیدیکە). ــ ی ئاو: کولاّنی زۆر. ــ ی دار و گیا: گەشەکردن.

هەڵچی

**هەڵچی** (هەورا.): کارگ، کوارگ. (جا.) قارچک.

**هەڵچیچکان** (بابا.): هەڵترووشکان.

**هەڵخەر:** ئەو کەسەی شت هەڵ دەخات.*

**هەڵخەڵەتان:** فریودان، تەفرەخواردن، خاپین، خران.

**هەڵخەڵەتاندن:** تەفرەدان، لەپاندن، خراندن، شیشەلێدان.

**هەڵخەڵەتاو:** هەڵخەڵەتێنراو.

**هەڵخەڵەتێن:** خەڵەتێن، فریودەر، تەفرەدەر.

**هەڵخڕاندن:** گەلاّڵەکردن، سازکردن، ڕێکخستن، پێکەوەنان.

**هەڵخڕاو:** شتی بەر هەتاو دراو بۆووشک بوون.*

**هەڵخڕێنەر:** گەلاّڵەکار، سازکار.

**هەڵخزاندن:** هەڵخزاندن.

**هەڵخستن:** تەناف ــ: ڕایەڵ کردن، ڕاچاندن. جل ــ: (خۆ.) ڕاکردن. ــ ی ئاو: بەرزبوونەوەی ئاو. ئاوێژتن، هاوێژتن.

**هەڵخلاندن:** بارەگوێز جوولاّندن.

**هەڵخلیسکان:** زەلین، هەڵزەلین. (هەورا.) سمکۆ. (باد.) حولیسین، لەزین، ترشین، خلیسکان، خزان، خزین، شمتین، فشتخین. ــ دن: زەلاندن، خلیسکاندن، خزاندن، خشکاندن، تەمساندن، خلسکاندن، فشتخاندن. خۆ ــ خوە خیزکردن.

**هەڵخلیسکاو:** خزیو.

**هەڵخلیسکین:** خزیو.

**هەڵخواز:** هەل پەرست.

**هەڵداشت** (موک.): هەڵدا.

**هەڵداشتن:** هەڵخلیسکاندن.*

**هەڵدان:** ئاوێژتن، فڕێدان، فەرکاندن، شێکردنەوە (بۆ مەتەڵ و پرسیاران)، هەڵنان، باس کردنی یەکێک یا چتێک بەخراپ بێ یا باش. نەش و نماکردن. خۆ ــ: خۆ مەدحکردن. چەتر ــ: چەتر بۆ حەوا فڕێدان. لەقسەدا ــ: هەڵی دایە. هەڵگڕان، پتربوون بۆسامان و جوانی. گەورەیی و سووکێتی و گەورەیی و گرانی و گەورەبوون بەکاردەبرێ. هەلاّویژتن، دیونای، هلدان. بەرد یا چتی تر هەڵدان. ــ ی ئالاّ: بەرزکردنەوەی ئالاّ. ــ ی سەیوان و خێوەت و ئالاّ. هەڵنەدان: لەنەشوونماکەوتن، کنانەوە، تێ هەڵدان.

**هەڵدانەوە:** هەڵێنانەوە، بڵندکردن، هەڵکردن، هەڵماڵین. ــ ی برین: لە نوێ وە تازەبوونەوە، ژیانەوەی. ــ ی قۆڵ و داوێن.

**هەڵدەر:** هەڵێن.

**هەڵدەرەوە** (زا.): دوری.

**هەڵدەستکەوتن:** دەرفەت دەستکەوتن.*

**هەڵدڕ:** کۆڵەر، بڕین. هەڵکەندنی زەوی، برینداركردنی لەش بەسەختی.

**هەڵدڕان:** هەڵبڕان، هەڵزڕان، هەڵدڕین.

**هەڵدڕانەوە:** هەڵماڵین، ــ ی قۆڵ و داوێن، هەڵکران.

**هەڵدڕاو:** هەڵبڕاو.

**هەڵدروو:** جوورە دروومانێکە دووپارچە پێکەوە دەدرێ. (دزە.) بن کێش.

**هەڵدرواو:** درواو.

**هەڵدروون:** درووماں، دروون.

**هەڵدڕین:** (باک.) ئاخڤاندن، ئاخڤین، هەڵبڕاندن، هەڵدڕان، هەڵبڕین، هەڵزڕاندن. کردنەوەی برین. زگ ــ.

**هەڵدۆشین:** ــ مەمک: بەدەست شیر لەمەمک هێنان.

**هەڵدێر:** هەورازێکی تووش و سەخت و دژوار. هەوراز، بەرزی، وەزدن. شوێنی لێژ و پڕ تەلەزگە. خۆ لە ــ ی ئاوێژتن: خۆ کوورکردن، فڕێدانی چتێک لەبەرزییەوە بۆ خوارێ یا بۆ هەوا هەڵدان.

**هەڵدێران:** لەشوێنی بەرز و سەخت کەوتنەخوارەوە. بەربوونەوە، کەوتن.

**هەڵڕژان:** ڕژان بەرەوخووار.*

**هەڵڕشتن:** دەردی دڵ ــ: درێژەپێدان. لەسەر ڕۆیشتن. قەرتاڵە ــ.

**هەڵڕێژان:** وەزرین، دەرخستن.

**هەڵز:** هەڵس، گیایێکە. نێوی ڕونێکیە لە ــ ی دروست دەکرێ.

هەڵزەڵین

**هەڵزەقین:** بڕوانە: وشەی هەڵتۆقین.

**هەڵزەڵین:** هەڵخلیسکان.

**هەڵزڕان:** دڕان، هەڵدڕان. ــ دن: دڕاندن، هەڵدڕاندن، زڕاندن.

**هەڵزڵەپان:** ئەستوور بوونی ڕوو.

**هەڵزووران:** هەڵکرووزان. ــ دن: هەڵکرووزاندن.

**هەڵزمار:** بژار، ئەژمار. ــ دن: ئەژماردن، بژاردن، هەڵبژاردن.

**هەڵس:** (هەورا.) فرمێسک، هەرس، هەڵز. (هەو.) ئەڵز. جووره گیایەکە، کۆڵکەکەی کارکی خواردنی دەردەکات. (ڕۆژ.) هەموو، گشت.

**هەڵسان:** هەستان. ـــ دن: هەڵستاندن، ڕاکردن، هەستاندن.

**هەڵسەنگان:** سەنگاندن.

**هەڵسەنگران:** (دژە.) هەڵسەنگان.

**هەڵست:** بەرقەدی کێوان، باسک یا سینگەلانی چیا.

**هەڵستان:** هورسەی، هۆستەی، هیزکەردە، هۆرزان، هەستان، وە ئاگاهاتن، هۆرزە، ـــ ی دیوار: گژگژین.

**هەڵستاندن:** هەستاندن، ڕاکردن، ڤەنهراندن، گژگژاندن، هلستاندن، وە ئاگاهێنان.

**هەڵسڵەمانەوە:** سڵەمینەوە.

**هەڵس وارنای:** (هەورا.): هەرس وارنای، فرمێسک هەڵوەراندن.

**هەڵسووڕان:** سووڕان، پێک هاتن، ڕێک خران، ڕێک کەوتن، سازبوون. ـــ دن: سووڕاندن، پێک هێنان، ڕێک خستن، سازکردن.

**هەڵسوون:** تێ هەڵسوون، تێدان، چەورکردن.

هەڵسی

**هەڵسی** (هەورا.): فرمێسک.

**هەڵشەپاندن** (کە.): لەنێوئاودا هەڵشێلان، کێشانەوە نێوئاو و شوشتن.

**هەڵشەپاو** (کە.): شوراو، هەڵشێلان، (کە.) هەڵشەپێنراو.

**هەڵشەنگان:** شانازی. ـــ دن (کۆ.): شانازی کردن، خۆ بە زۆر گەورەزانین.

**هەڵشکاوتن** (ڕەوا.): هەڵکەندن.

**هەڵشلەپان:** نقوم بوون.

**هەڵشنگاندن** (بابا.): هەڵتەکاندن، خۆ جوولاندن.

**هەڵشێلان:** هەڵشەپاندن، شێلان، گەوزاندن، بەسەر ڕۆیشتن، لەنێو ئاویدا.

**هەڵشێلراو:** هەڵشەپاو.

**هەڵفلماندن** (ڕۆژ.، کە.): (ڕۆژ.) گلماندنەوە، گەوزاندن، بۆ سەگان بەکاردەبرێ، کە یەکتری هەڵشێلن.

**هەڵفڕان:** فڕین، بەرزبوونەوە. ـــ دن: فڕاندن، هەترەکردن، هلفڕاندن، ڕافڕاندن.

هەڵفڕان

**هەڵفرچکین** (شەم.): هەڵفڕین.

**هەڵفڕین:** هلفڕین، (شەم.) هەڵفرچکین.

**هەڵفریوان:** فریوخواردن، تەفرەخواردن. ـــ دن: فریودان، تەفرەدان.

**هەڵفریوێن:** فریوەدەر.

**هەڵفلیقاندن:** گوشینی زۆر، پلیشاندن.*

**هەڵقاچین:** هەڵپاچین.

**هەڵقەدار** (باک.): جوورە تفەنگێکی بە بەردییە.

**هەڵقەن:** هەڵکەن.

**هەڵقەناندن:** هەڵکەندن.

**هەڵقەندن:** هەڵقەناندن، کولاندن، ئاشێف، هەڵکەندن، کۆڵین، بۆت کردن، قەوارتن، مەربەخ، هەڵکەندنی زەوی یا چتێکی دی بە پاچ و ئیتر.
لەڕیشە ـــ: قوورافتن.

**هەڵقرچان:** قرچان، قرچنای. ـــ دن: قرچاندن، لەگەرمان ـــ . ڕژن ـــ: قرژاندن.

**هەڵقرچاو:** قرچاو، هەرز، پێستی لەشی مرۆ لەسەرمان یا لە گەرمان هەڵقرچێ.

**هەڵقۆچان** (دژە.): هەڵەنگوتن.

**هەڵقوتاندن:** خۆ ـــ: هۆ هەڵقوون، خۆتێکەڵکردن.

**هەڵقووت:** دەرخستن، دیارکردن.

**هەڵقوڕاندن:** فڕکردن، هەڵ لووشین.

**هەڵقوورینچان:** (هەو.) قوولینچک. ـــ دن: قووریچەنگ، قونجرکە لێدان.

**هەڵقورێنجراو:** (باک.) ترهە.

**هەڵقوڕاندن:** (هەورا.) هۆرش قۆڕنی. (باک.) پەژقین. فڕکردن.

**هەڵقوورینجان:** کونجرین. ـــ دن: کونجراندن، نقووچ لێدان.

**هەڵقولان:** (باک.) پەژقاندن.

**هەڵقولاندن:** (باک.) پەژچاندن.

**هەڵقولین:** (باک.) بەلقاندن.

**هەڵقوون** (زەن.): خۆ تێ هەڵقوتین.

**هەڵکالان:** تووک کردن، فڕاندن، پێ هەڵکالان: تووک لێکردن.

**هەڵکەتە:** گیایەکە.

**هەڵکەفت:** هەڵکەوت، ڕێکەوت.

**هەڵکەفتن:** هەڵکەوتن.

**هەڵکەناندن:** هەڵکەندن.

**هەڵکەندران:** دەرهێنان لە ناخی زەوییەوە بەڕیشەوە.

**هەڵکەندن:** (فە.) هەڵکەنین. (هەورا.) کەنای. (باک.) بۆت کردن. لەڕیشە دەرهێنان، هەڵکەنن، هەڵکەناندن، هوورکەنەی، هەڵقەندن، وورکەنن، هەڵکرن. کۆڵین.

**هەڵکەوت:** دەرفەت، هەل، چەخش، دەگمەن.

**هەڵکەوتن:** پەیدابوون، گوڵێکی کێوییە. هلکەتن، چوونەسەر، دەرکەوتن، هەڵدان.

**هەڵکەوتوو:** میرکوور، هۆکەڵ.

**هەڵکران:** هەڵدران، هەڵماڵران (بۆ قۆڵ و داوێن و دەلینگ). شەولقین، ڤێکەتن. ـــ ی چرا و ئاور.

**هەڵکڕان:** خوران. ـــ دن: خوراندن.

**هەڵکراو:** پێکراو. قۆڵی ـــ: قۆڵی هەڵدراوەوە.

**هەڵکڕاو:** خورێنراو، داماڵراو.

**هەڵکرتەنی:** (باک.): بقۆرس، بکۆرس.

**هەڵکردن:** هلماشتن، هلمشتن، هەڵماشتن، داچناندن، هەڵماڵین، هەڵدانەوە، هەڵوژین، هەفتم، هەدام، لوول دانەوە، هەڵوەژنین، داگیرساندن، هەڵگیرساندن، پێکردن. داگیرساندن، (سور.) ڤێخستن، (هەورا.) گرسانن. شەولقاندن. سرەوتن، ئارام گرتن. باربردن: لەگەڵ هەڵگرتن. قۆڵ ـــ، داوێن ـــ، دەلینگ ـــ، باوبۆران.

**هەڵکرووزان:** (باد.) لوزرین.

**هەڵکزان:** ـــ ی گۆشت.

**هەڵکزاندن:** (هەورا.) هۆرکزانن.

**هەڵکشان:** هڵکشان.

**هەڵکفان:** هەڵترشان. ترشان و کەفکردنی ماست و دۆشاو و ئیدیکە لەگەرمان. ـــ دن: هەڵترشاندن، کەفوکوڵ کردن.

**هەلکۆ** (باک.): بزۆز، بزوێن.

**هەڵکۆڵ:** کۆڵەر.

**هەڵکۆڵران:** کۆڵران.

**هەڵکۆڵین:** هەڵکەندن، هەڵقەندن. (هەورا.) هۆرکەندەی.

**هەڵکوتان:** هێرش و شالاۆهێنان. ـــ ە سەر: پەلاماردان. ـــ ە سەردوژمن: پەلاماربردنە سەر، هێرش بردنەسەر.

**هەڵکووتن:** هەڵنان. هلنکفین. پێ ـــ: پێ هەڵدان، هەڵنان.

**هەڵکوچان:** هەڵتۆترەکان، هەڵتروشکان. هەمیشە بۆسەگ و دڕندە بەکاردەبرێ.

**هەڵکورووزان:** سووتان، هەڵزووران. گۆشت لەکاتی برژاندنێدا نیوەی بسووتێ. ـــ دن: هەڵزووراندن.

**هەڵکوشێن:** کووشێن، کووشەر.

**هەڵکێش:** خۆ ـــ: (باک.) خۆف. (هەورا.، بابا.) پارچەچی. بافیش کەر، بەچاو و ڕاو، چاوو ڕاوکەر.

**هەڵکێشان:** بڵند و بەرزکردنەوە. هلکشاندن. بەگوێ ـــ: بەگوێ هەڵێنان. خۆ ـــ: بەخۆهەڵکوتن، شانازی کردن، خۆهەڵنان، نازپێوەکردن، فیشاڵکردن.

**هەڵگەڕان:** بڕسکان، هەڵبڕسکان، هەڵبزڕکان، بڕکانەوە، شیری هەڵگەڕاو، پێ هەڵچوون بە دارو چیایاندا، هەڵگڕان. ڕەنگ ـــ: ڕەنگ پەڕین.

**هەڵگەڕانەوە:** ئاوەژوو بوونەوە. لێ ـــ: سەرکێشی کردن.

**هەڵگەڕاو:** ئاوەژوو، وەرگەڕاو.

**هەڵگەڕیو** (دەر.): بەراوەژوو، ئاوەژوو، وەرگەڕاو.

**هەڵگەواشتن:** گوێزتنەوە.

**هەڵگر:** (باک.) داگرتەک.

**هەڵگڕان:** داگڕان، هەڵدان. بە بەرقەدی کێو و جێگای بڵنددا هەڵچوون، زۆر ساماندار و دەوڵەمەندبوون.

**هەڵگڕاو:** زۆر دەوڵەمەندبوون، زۆر لەخۆ دەرچوون.

**هەڵگرتن:** بڵندکردن، ڕاکردن، قەتاندن. (هەورا.) هۆرگێرتەی، هلگرتن، هنگرتن. ڤەنهڕین، ودێران، هلبرن. تەقەت کردن لە جێگایەکی تایبەتیدا. ڕفاندن، فڕاندنی ئافرەت یا چتمەک یا ولاخ.

**هەڵگرتنەوە:** ڕێک خستنەوە، هەڵبژاردنەوە. ـــ ی ماڵ: هەڵوەژاردن و خاوێن کردنەوە.

**هەڵگرپان** (هەورا.): پێ هەڵچوونی دار.

**هەڵگۆت:** هەرگۆت.

**هەڵگوتن:** هەڵنان. بەخۆ ـــ: خۆهەڵنان.

**هەڵگورد:** بڵند، کێوێکە لەکوردستانی عیراق. لە جغرافیا (حسار ڕۆست) ی پێ دەڵێن.

**هەڵگۆفتن:** هەڵپشاوتن، گلۆفتن. چاو ـــ: چاوکوشین، چاوهەڵپشاوتن.

**هەڵگوورین** (جا.): ئاوهەڵکێشان.

**هەڵگێڕ:** ئەو کەسەیە چتێکی بۆلای سەری ئاوەژوو بکاتەوە.

**هەڵگێڕان:** بەرەو ژووربردنی ماڵات یا ئاو.

**هەڵگێڕانەوە:** وەرگێڕانەوە، ئاوەژووکردنەوە، گۆڕین.

**هەڵگیران:** تاقەت بوون، تەقەت کردن.

**هەڵگیراو:** تەقەت کراو.

**هەڵگیرسان:** هەڵکردن، هەڵاییسان، داگیرسان، هلکران.

**هەڵگیرکە:** وەرگیرکە، منداڵێکە کەم کەمە کاری پێ بکرێ.

**هەڵگێڕ وەرگێڕ:** ئاودیوا و دیوکردن، ئاوەژووکردنەوە، هەڵدانەوە.

**هەڵڵا:** هەلا، کێشە، دەنگ. بریو.

**هەڵڵاهەڵڵا:** بریوەبریو، قریشتەقریشت، دەنگەدەنگ، گرمەگرم.

**هەڵ لووشین:** لرفدان، لووشین، لرفکردن، هەرچتێکی بکرێتە نێودەم بەبێ جوون قووت بدرێ.

**هەڵ لێسین:** لستنەوە.

**هەڵم:** (باک.) هلم، هێلم، هەڵماتک، هیلم.

**هەڵمات** (بابا.، کە.): (هەو.) کەلا. شووشە یا بەردێکی خڕی بچووکە منداڵ گەمەی پێدەکەن.

**هەڵماتک** (زەن.): هەڵم.

**هەڵماتێن:** کەلا یانێ، مەڕمەڕێن.

**هەڵمشتن:** هەڵکردن. (بۆقۆڵ و باسک).

**هەڵماڵران:** هەڵدرانەوە، هەڵکران.

**هەڵماڵین:** هەڵدانەوە، هەڵکردن.

**هەڵمەت** (کە.): پەلامار، هێرش، ئێرش، شالاو.

**هەڵمەتەکاسە** (سل.): هەڵمەشە. پەلاماردەری بێ جێ.

**هەڵمەقۆ:** بازەڵە، بازەڵێن.

**هەڵمەقووتە:** قامکی نێوەڕاستی، ئەرنەمووتە، قامکی قولێ. تلیا ناڤین، تلیا ناڤچار. نێوەک.

**هەڵمەڵە:** هێرۆ.

**هەڵمرووسین** (سور.): هەڵمژین.

**هەڵمز:** مژۆک.

**هەڵمژتن:** هەڵمژین.

**هەڵمژین:** هەڵمووسین، هەڵمژتن، هەرمڵێسین. ـــ ی ئاو: قوم لێدان. ـــ ی جغارە: قوم لێدان.

**هەڵمسان:** هەڵامسان، پەنغان. (هەورا.) ماسان. (باک.) پڕبوون. (هەڵ.) ئاماس بوون، ئاماسان. ـــ دن: (باک.) پڕکردن.

**هەڵمساو:** ئاوساو، هەڵامساو، پەنغاو.

**هەڵمیزتن:** ڤەمستن. میزکردن بەپێوە.

**هەڵمیشک**: چێشتێکە لە دۆشاو و ڕۆن دروست دەکرێ.

**هەڵنان**: هەڵگوتن، پەسن دان، هەڵدان، پاسین، فش کردنەوە، فۆرتەکی، بەتانا چوون، بەتانا چوونەخوارەوە. خۆ ـــ: فۆرت خوەدان.

**هەڵنەر**: هەڵنێر، باسکەر. خۆ ـــ: فۆرتەک.

**هەڵنراو**: باس کراو، پەسن کراو.

**هەڵنووچاندن** (هەورا.): (دزە.) بادانەوە. (موک.) داگرتنەوە.

**هەڵنیشان**: (موک.) نوشتەوا.

**هەڵنیشاندن**: ڤەنشتن.

**هەڵنیشتن**: ڤنان، نیشتن. ـــ لەسەر لکی داران. (بۆ باڵندان).

**هەڵۆ**: کولالەمار. (باک.) ئەیلۆ، ئەڵهۆ. (نێوی پیاویە).

**هەڵوا**: (باک.) ئاردەپێچ، ئاردی. هەلیل. هەلوا، ئاواو. ـــ پێکردن (موک.): مەبەس لە تێهەڵدانە.

**هەڵواستن**: هەڵاوەسین.

**هەڵواسین**: هەڵاوەسین، هەڵواستن.

**هەڵوەدان**: ئاوارە، دەربەدەر، ـــ بوون: تاربوون. (بڕوانە هەڵوەدە).

**هەڵوەدە، هەڵوەدا** (خۆ.، هەو.، موک.): تارومار، ئاوارە، دەربەدەر، هەترە، هەتڵە، تار، ـــ بوون: تاربوون. بەشوێندا گەران و عەبدال بوون.

**هەڵوەر**: ئەو درەختەیە، کە گەڵا و بەرەکەی کەوتبێ یا هەڵوەریبێ.

**هەڵوەران**: هەڵوەرین. ـــ دن: رزاندن، وەراندن، گەلفاندن، گەلفچاندن، هەڵپرووکاندن.

**هەڵوەرێنەر**: ڕزێنەر.

**هەڵوەرین**: وەرین، وەران، هەڵپرووکان. (باد.) دەحکیان. ڕزین، گەلفین، ڕزان. گەلفچین.

**هەڵوەریو**: ڕزیو، ڕزاو، بێ زەوەر.

**هەڵوەزنین**: هەڵوەیزنین. هەڵویزنین، هەڵکردن و بادانی بەن و ئیدی، پێچانەوە.

**هەڵوەزاردن**: ـــ ی ماڵ. هەڵگرتنەوە و ڕێک و پێک کردنی نێوماڵ و دوکان.

**هەڵوەلا**: هەڵوەدە، هەوڵ و تەقەلا.

**هەڵوەستان**: ویستان، ڕاوەستان، داخواز و کڕیاربوون.

**هەڵوەستاو**: کڕیار، داوخواز.

**هەڵوەشان**: هەڵتەکان. ـــ دن: هەڵتەکاندن. (باک.) پشاشتن، ڤەرستیای، بقەشاندن، هەڵپشکاوتن، هلوەشاندن، دەست تێوەردان، لێک جوێ کردن، تێکدان، شەقاندن، پشکوتاندن.

**هەڵوەشێنەر**: هەڵوەشێن.

**هەڵوێ** (هەورا.): خرویرکە.

**هەڵوێسین**: هەڵاوەسین.

**هەڵۆ**: (ئاک.) کولالە مار. باڵندەیەکی بۆر و تیژباڵە لە ئەلەموونەی گەورەترە، ڕاوکەرێکی کێوییە و گۆشت خۆرە و گۆشتی ناخورێ.

هەڵۆ

**هەڵۆڵ** (شا.): هولۆڵ، نیوبەتاڵ.

**هەڵویچکە** (دەر.): هەڵووچە.

**هەڵوێک** (ڕۆژ.): هەلووک (ئی هەلووکێن).

**هەڵوێکان** (ڕۆژ.): هەلووکێن.

**هەڵوێنی**: قەیسییەکە چەقاڵەکەی شیرین بێت.

**هەڵوو** (باڵە.، ئامێ.): هەستە.

**هەڵووپەر**: چارەسەری.

**هەڵووت**: پێداهەڵکوتن.

**هەڵووچە**: ئاڵووچە، گەلاز، گوجە، (ڕەوا.) هەڵووچکە، حەلووکە، حەلووچکە، هەڵویچکە. (کە.) هەڵووژە، هەڵووژە ڕەشکە. هەرووگ. دارێکە بەبەرەکەشی هەر دەڵێن هەڵووچە.

**هەڵووردن**: نیشتنی باڵندان.

**هەلوورک** (جا.): جۆلانە.

**هەلوورکە**: لەرانەوە، جوولانەوە، لەرزین.

**هەڵووژە**: هەڵووچە.

**هەلووک**: دارێکی کورتە بەقەد بستێکی یە هەردووک سەرەکانی قەدکراون (قەلەم کراون) لە گەمەی هەلووکێنیدا بەکار دەبرێ. هەلوکێن، (ڕۆژ.، کە.) هەلویک. (هەو.، کۆ.) پەلیک. (باد.) پلیک. پەلیکانێ.

**هەلووکان**: بڕوانە: هەلووکێن.

**هەلووکێن**: (هەو.) پەلیکانێ، هەلوێکان.

**هەڵۆن** (ڕۆژ.): هەڵەیە، چەوتە.

**هەلویک** (ڕۆژ.، کە.): هەلووک.

**هەلویکان** (ڕۆژ.، کە.): هەلووکێن.

**هەڵهاتن**: هەڵاتن. دەرکەوتن. ـــ ی هەویر: ترشان. ـــ ی ڕۆژ.

**هەڵهاتوو**: هەڵاتوو.

**هەڵهاوردن** (کە.): هەڵێنان. ـــ ی مەتەڵ. ـــ ی هێلکە.

**هەڵ هەڵە**: جارجارە.

**هەڵهەڵۆک** (گەر.، بار.): (کۆ.) بەلاڵووک. (باک.) قەیسی کێوی. دەنکەکانی ورد و خڕە.

**هەڵهێنان**: هەڵێنان.

**هەڵێ** (باک.): بێ خوێ. لاواز، بێ تین.

**هەڵیکی**: جارێکی، دەرفەتێکی.

**هەڵێنان**: هەڵهێنان، بڵندکردن، هلینان. سەر ـــ: سەرهەڵبڕین. چاو ـــ: چاوهەڵبڕین. جووچکەهەڵێنان. قەگزگڕاندن. ـــ ی مەتەڵ. بەگوێ ـــ: بەگوێ چپاندن. پشوو ـــ: حەسانەوە. پشوودان.

**هەڵێنانەوە**: هەڵدانەوە. دووبارە بڵندکردنەوە.

**هەڵێنج**: هێڵنج (بۆ ڕشانەوە).

**هەڵێنجان**: ئاو لەبیر ـــ: ئاو دەردان، دەرخستن. لەمەنجەڵ ـــ: دەرهێنان.

**هەڵیت**: بێهوودە.

**هەڵیت و پەڵیت**: وتەی بێ واتا و پڕوپووچ.

**هەڵیزار** (هەورا.): گیابرە.

**هەڵیزە** (هەورا.): هەڵیز، مەشکە.

**هەڵیز** (هەورا.): باژەڵە. گیایەکە لە نێو دەغڵیدا شین دەبی، بنەکەی سپی و گچکەیە و دەخوریّ، بەرزیێک بڵند دەبیّ. گەڵاکەی تیژە.

**هەلیسە** (لور.): کەشکەک.

**هەلیل** (باک.): هەڵوا.

**هەلیلە**: دەرمانێکە.

**هەلیلۆک** (باک.): بەلگە. پارچە نەرمە خرەکەی بەگوێوە نووساوە.

**هەلینگ دان**: غاردان، لنگ دان، هەڵتەک هەڵتەک، ڕاکردن.

**هەم**: هاو، ژی، هەر، هەمیسان، ئەویش.

**هەما** (باک.): هەمان، هەرهێندە، یەک لە دووی یەک، نزیکەی.

**هەمار**: ئەنبار، کۆگا. ـــ کردن: وەسەریەک نان.

**هەمامۆک** (باک.): ئاوردەست.

**هەمان** (باک.): هەما، هەرهێندە.

**هەمانە** (کە.): هەمبانە. (باک.) بەربەرەکانە، ڕووباری.

**هەماهەما**: نێزیکی.

**هەمای** (هەورا.): هێشتا.

**هەمەت** (باک.): پەنا، حەشارگە. ـــ ا خوەکرن: خۆپەنادان، خۆپاراستن.

**هەمەتە**: دیدەوانی، چاوەڕێیی، چاوەنۆڕی. (ئاوێ.) هەمیشە.

**هەمەرەنگە**: (کە.) گۆناگۆن.

**هەمەکارە**: دەراستی سەربەخۆ، زانینی یا وەستایی لەچەند پیشەیەکدا.

**هەمەوەند**: هۆزێکە لە کەنار کەرکوک دادەنیشیّ.

**هەمبازی** (کە.): زۆرانی گرتن.

**هەمبانە**: هەمانە، تیشوودانە، تۆشەوانە، تێشووبەرە.

**هەمبەر** (باک.): بەرامبەر، هاوشان، وەکو، ڕووبەڕوو، پێش. ـــ مەدا: لەپێش ئێمەدا.

**هەمبیز** (باک.): ئامێز، هامبیز، هامێز، باوەش.

**هەمپا** (باک.): هاوتا، وێچوو.

**هەمتام**: هاوتا.

**هەمتز** (باک.): گوێدرێژێکی چکۆڵە و قایم وپتەوە.

**هەمراز**: هاوڕاز، برادەری گیانی.

**هەمرۆ** (هەورا.): هەرمێ.

**هەمدەم**: هاودەم.

**هەمس** (باک.): بزنێکە هەمووسەر و لەشی سپی بیّ.

**هەمسا، هەمستا** (فە.): هاوسیّ، دەراوسیّ.

**هەمشاری**: هاوشاری.

**هەمشیرە** (فە.): دوورکەس، کە شیری یەکتریان خواردبێتەوە.

**هەموو**: گشت، تێکڕا، خشت، خڕ، تەواو، سەراپا. (باک.) تەف، تەڤ، تەڤدە، دەهڤ. (هەورا.) ڕایگەم. لووس، هەمی، هەڵس، جەم.

**هەموودەم**: هەموکاتێک.

**هەمووی**: گشتی، تێکڕای، هەمی، سەراپای.

**هەمەمە**: چاو و ڕاو.

**هەمی** (باک.): هەموو.

**هەمیان**: همیان، تەگبەند، کەمەر، پشتێند.

**هەمیر** (هەورا.): هەویر.

**هەمیر پڕان** (هەورا.): هەویر پەڕین.

**هەمیر ترش** (هەورا.): هەویر ترش.

**هەمیز** (باک.): ڕەق، ڕێک کوشراو.

**هەمیسان** (کە.): دیسانیش، هەم، دیسان، ئەوجار، ئەوجارەش.

**هەمیشە**: هەروهەر، هەمەتە، هەرگاڤ. (باک.) تم، تموتم، بینا، تۆف. هەرچاخ، یەک بینە.

**هەمیشەبەهار**: گوڵێکی نارنجی و زەردی هەیە، هەمیشە سەوزە، لە هەموو چاخێکدا گوڵی هەیە.

**هەمیشەمووی**: ژنێکە هەر ڕۆژە مێردێکی بکات.

**هەمیشەیی**: نەمر، جاویدان، بەردەوام.

**هەن**: بوون، ئەوەی هەیە. (هەورا.، ڕۆژ.) هەیە.

**هەنا** (ڕۆژ.): گومان، دوودڵی، هەرلە ـــ: هەر لە خۆیەوە بیّ ئەوەی ئاگاداری لیّ هەبیّ.

**هەنار**: دارێکە بەبەرەکەشی دەڵێن ـــ. هنار. (هەورا.) نار. نێوی ئافرەتییە. گوڵی ـــ ی: جینجینارۆک.

**هەنارەیی**: تیرەیەکی شکاکانە.

**هەناردن** (باک.): ناردن. ـــ وە: گەڕاندنەوە، ڕەوانەکردنەوە.

**هەنازا** (بابا.): زڕکوڕ.

**هەناس** (ڕۆژ.): حاست، ئاقار، ڕاست.

**هەناسە**: سۆزە، بهن، نزە. (باک.) کەسەر. ـــ هەڵکێشان: (باک.) ئاخن، کەسەرنانین.

**هەناسەبڕکە**: خورە چەرە، هانکەهانک. هەناسەی دژوارە دوای ماندووبوونی هەڵدەکێشریّ.

**هەناسەسارد**: ئاهی سارد، ناهومێد، نائومێد. هیوابڕاو، کۆڵەوار.

**هەناسە سوار**: هەناسە تەنگی.

**هەناسەکێشان**: هەناسە هەڵکێشان.

**هەناسەی هەرەدوایی**: هەناسەی سەرەمەرگ.

**هەناف**: هەناو.

**هەناو**: هەناف، هناو، جەرگ و ناو، سپیەلاک.

**هەنەک** (هەکا.، باک.): گاڵتە. ـــ ی خوەپێکرن. ـــ ان لێکرن.

**هەنەکار**: گاڵتەچی.

**هەنەکچی** (باک.): گاڵتەچی، هەنەکار، هەنەکۆ.

**هەنەکۆ** (باک.): گاڵتەچی.

**هەنەهەن**: بڕوانە: هانکەهانک.

**هەنتەش** (باک.): پێش، ئامادە. د هەنتەشا ویدا: لە پێش ئەویدا.

**هەنجاڕ** (زاخ.): دەنک.

**هەنجنراو:** جنراو، ئەنجنراو، قیمەکراو.

**هەنجنین:** ئەنجنین، جنین، جناندن.

**هەنجیر:** (لو.) ئەنجیر. دارێکە بەبەرەکەشی دەڵێن ـــ . هەژیر، هێژیر، هژیر. نانی ـــ ی: (هەورا.) لەپۆرت. (بابا.) خەروە. ـــ ی وشک: سەوک، قووتکە. ـــ ی باوا: مۆز. ـــ ی کێوی: ڕژک.

**هەند:** هێند، بڕ، چەندان، نەخت. (باک.) ئەڤچەند، ئەوچەند. لەگەڵ ـــ یش: دگەل ڤی چەندی، دگەل ڤی هندی. بە ـــ گرتن: بەگرنگ زانین. (باک.) دان سەر. ـــ ێ: نەختێ، گەردێ، کەمێ.

**هەندەران:** دەرەوە، لاوە.

**هەندەزە** (باک.): ئەندازە.

**هەندەسە:** ئەندازە.

**هەندەڤ** (باک.): بڵندی.

**هەندەیی:** چاوچنۆکی، چاوبرسی.

**هەندرێشە:** (هەورا.) ئەندریشە، گیایەکە پەلکی سێ سووە وەکو کەوەری وایە دەخورێ و بۆنی خۆشە.

**هەندرێن:** سێیەمین کێوی کوردستانی عێراقییە لە بڵندیدا. لەڕۆژهەڵاتی ڕەواندزییە.

**هەندرێنە:** گیایەکە شیرەکەی دەبێتە لاستیک.

**هەندک** (باد.): کەمێک، هێندێک.

**هەندوو:** (شن.، موک.، ڕەوا.، خۆ.) دۆم (تیرەیەکە).

**هەندێ:** هێندێک.

**هەندی:** بڕ، چەند.

**هەندیگاوێ** (خۆ.، ڕەوا.): ئێستا، وێستا، هەوکە، هەنوکە. (ڕەوا.) هەندیگایی.

**هەندیگایی** (ڕەوا.): ئێستا.

**هەنگ:** مێشەنگ، مێش هەنگوین. هەنگی ولاخان لەکاتی قەڵەوبوونیدا: هێنگ.

**هەنگاڤێ:** ئێستا.

**هەنگافتن** (خۆ.): ئەنگاوتن.

**هەنگام** (هەورا.): هەنگاو.

**هەنگامە:** گۆنگەڵ، هێل، هێلان، سەرهات، کۆلاو، کارەسات، ڕووشە، نەگبەتی، ڕووداو، بەسەرهات، ڕووشە و قۆرشە. (باک.) بۆبلات، بوونەبوون.

**هەنگاو:** شەقاو، شاقاو، گاو، هەنگام، لۆق. (کە.) ئەنگاو. (زا.) پێنگاڤ. پێنگاو.

**هەنگاوتن:** ئەنگاوتن.

**هەنگاوێ:** ئێستا.

**هەنگەچینە، هەنگەوچنە** (هەورا.): هەنگەخۆرە، مێش خۆرە. باڵندەیەکی سەوزی دندووک درێژە دەنگی ئێجگار ناخۆشە و بۆرە، بەقەد قەتییە فەرخە هەنگان دەخوا.

**هەنگەخۆرە:** (هەورا.) هەنگەچینە، مروو، مەریکانە. باڵندەیەکی چکۆلەیە هەنگان دەخوا. جۆرە کرمێکە لەنێو خلیفیدا پەیدا دەبێ و فەرخە هەنگان دەخوا.

**هەنگەون** (هەورا.): دارێکە کەتیرەی لێ پەیدا دەبێ. گوێنی.

**هەنگخانە:** خلێف.

**هەنگران:** بەلێدان کەوتنەسەری. هەلگێران، دەوڵەمەندبوون.

**هەنگڤین:** بڕوانە: هەنگوین.

**هەنگڵ:** خاڵکە، قولف، قلف. (هەورا.) دەسە. (باک.) چەپل، چەمبل، چەمل. دەسکی دیزە و گۆزە و وانەیە.

**هەنگڵەشەلە:** (هەو.) ئێسترە شەلە، پێ پێ یانێ (گەمەیەکە لەسەر لاقێک دەڕۆن)، چووزەکە.

**هەنگوان** (هەورا.): گیایەکە وەکو (یەڵدز) ی ترکی وایە. ئەنگوان. (شن.) گوان، گووران.

**هەنگواو:** ئەنگێوراو، گووراو، گووار.

**هەنگۆ:** ئێوە.

**هەنگۆر** (شکا.): ئێوارە، هێوارە.

هەنگوتن: ئەنگاوتن، پێکان.*

**هەنگوور** (هەورا.): ترێ.

**هەنگوورە** (باک.، ئە.): بەوجوورە، بەوچەشنە، بەوتەرزە. (کەرەجنە).

**هەنگووژاوی** (هەورا.): جیوە، جەوی.

**هەنگوین:** هەنگڤین، کاریت، کۆتەفر، هنگف، هنگوف.

**هەنگێ** (ڕەوا.، هەو.): ئەودەمی.

**هەنگێوران:** ئەنگارتن، هەنگاوتن.

**هەنگێنی** (ڕەوا.): ئەودەمێ، هندێ.

**هەنوان:** پەنا، پەسیو، جێگایەکیشە، کەباران و بەفر و با نەیگرێتەوە، هەنوین، هەنین: شێلان.

**هەنووکە:** ئێستا.

**هەنوون** (ڕەوا.): هەنوین.

**هەنوین:** هەنوان. (ڕەوا.) هەنون. لەش ـــ: بەرۆنی چەورکردن. دەست لێ خستن و سوونەوە و دەست پێداماڵین.

**هەنێ** (کە.): هێندێک.

**هەنی:** هەنیە. (سن.، هەورا.) شووتی. (باک.) نێوچاوان. (زا.) هێ، هۆ و پیاوێ هێ. (هەورا.) هێشتا.

**هەنیە** (موک.) نێوچاوان، تەوێڵ. بەبن زولف و قەراخی مووی سەری ژنان دەڵێن هەنی. ـــ هەڵگرتن: ڕووگرتن. (باک.) بەروانێک. گەندە تووکی نێوچاوان و ڕوومەت هەڵکەندن.

**هەنیسک:** هەنسک، نسکە. (باک.) نیسکۆک، نیسک. ئەو هەناسە قووڵانەیە، کە لەکاتی و لە دوای گریانی دا هەڵدەکێشرێ.

**هەنیشک:** ئانیشک.

**هەنین:** هەنوان. نیشتن و بەدەن ـــ بەرۆنی یا بە هەنگوینی.

**هەو:** قازانج، هۆ، هەم، هار، ئەو. هەمشاری: هاوشاری. بۆ نیشاندانی چت یا مرۆ یا گیانلەبەری سێ یەمە، کە نەدیو یا ئامادەبێ: ئەوە هەوە. ئەو هەوبوو. کێم، هەوا، (کە.، ڕۆژ.) ئێش، دەرد، ژان. ئاوسان و

هەلامسـانی جێگایـەک لـەلـەش. لـەکاتی واق ورمـانیدا بـەکاردەبرێ. (باک.) هیچ وە خێتێک. ـــ کردن: وازلێهێنان.

**هەوا:** فیز، خرایی، ڕێڤناهی، ترزلی. دڵداری، بەهەوا: (باک.) خرا، بەفیز، بێندەر. ـــ سارده، ـــ گەرمە. بە ـــ: خوێن، خوەبین، هەوادار، کێم زرزره، زووخاو، نیم، برانگوون. بە ـــ: هینوان زل، ترزل، بایی، بافەدنگ، بۆنگ، خۆپەسند، گیف، هەودا، بەفیز، فیزدار. ـــ ی تێکەڵ: ـــ ی چەند قۆلی. بە ـــ: دفره، بە ـــ بوون: بەفیزبوون، هەلاتگران، بڵندفرین.

**هەوادار:** بەهەوا، کێمدار، بەهێز، پشتیوان.

**هەوار:** شوونوار، وار، وارگە، هەوارگە. (باک.) بانە، هاوار، بانەمەڕ.

**هەواخواز:** لایەنگیر.*

**هەوارگە:** (هەر.): وارگە، ئاغەلان.

**هەواری:** خێوەتی گەورە.

**هەواڵ** (باک.): ئاوال.

**هەواڵیەتی:** هەڤاڵەتی، برادەرایەتی، دۆستایەتی.

**هەواڵبەند** (باک.): هاوپەیمان.

**هەوا لێپرسین:** سۆراخکردن.

**هـەوان:** ئـاونگ، دەسـتـە و هـاون. گۆنگەڵ، کارەسات، گێچەڵ. (باک.) هەبان.

**هەوانتە:** ئاسان، خۆڕا، بێ لێپێچانەوە.

**هەوانتەخۆر:** مفت خۆر، ئاسان خۆر، چاوتێ بڕیو.*

**هەوایی:** سەودایی، باسەر، بەفیز، عاشق. نێوی پیاوانە.

**هەوە** (کە.): هەوێ.

**هەوەڕ:** (هەو.، پژ.، هەورا.): هیربار، قاپ و قاچاخ، ئامانی شیوێ.

**هـەوەس:** ئاسـە، کـەوژ. ـــ ی خـۆڵـێ تـەخت لێکـردن: کـەوژا خـوە لـێ شکەنادن.

**هەوەڵێهێز:** ئەیلول.

**هەوەڵزستان:** کانوونی دووەم.

**هەوت** (باک.): عەوعەو. وەڕ وەڕ. ـــ کردن: عەوعەوکردن، وەڕین.

**هەوجا** (جا.): ئەمجا، دەسا، ئەوجا، سا.

**هەوجاڕ** (دزە.، هەو.): دەندە.

**هەوجهار** (باک.): بیبەری سوور.

**هەودا:** داوە دەزوو و نیسترِ. (بابا.) هـەوا، تـەڵ، داو. (ڕۆژ.) تاڵ، هاوا. (هەو.) کەڵ. ئاڤدا، هەڤدا.

هەودا

**هەودان** (باک.): دالان.

**هەودانەوە:** هۆدانەوە.

هەودانین: دامەزراندن، پێکخستنان.*

**هەودەچ** (باک.): کا و پەینی وشک بەژێر پێی ولاخان وەردەکرێ.

**هەودە:** حەڤدە ١٧.

**هەودل** (باک.): گادۆشە. قابێکی گەورەیە مانگای تێدا دەدۆشی.

**هەودوو** (باک.): یەکتر، یەکتری.

**هەور:** (فە.، هەورا.، باد.): ئەور. ـــ ە تریشقە: (باک.) ئەورترشکی. ـــ ی تەنک و سپی: کەشەور. ـــ ی ئاسمانی: کـەرەور. ـــ ی سـەرچاوان: تانە.

**هەوڕ** (بڵ.، شا.، پژ.، سیوە.): ئاسنجاو، قاپ و قاچاخ.

**هەورا** (شەبە.، ڕۆژ.): برسی.

**هـەوراز:** بـەندەن، بڵـنـدی، بـەرزی. (باک.) بڵندایـی، بڵنداهـی، ئـەرڤاز، ئـەرواز، ئـەڤراز، ئـەڤرا، هـەڤراز، ژۆر، ژۆروو، ژوور، ژووروو. هـەڵدێر، وەژەی. ـــ ی سەرەوژێر: سەردۆڵە.

**هەورامان:** مەڵبەندێکی شاخاوی چڕە، بەشێکی لەنێو کوردستانی عیراقە و بەشەکەی تریش لـە کوردسـتانی ئێرانە، شـارەکانی هەڵەبجـە و پـاوە و مەریوان لەم ناوچەیەن.*

**هەورامانی** (هەو.): بەدانیشتوانی هـەورامان دەڵێـن ـــ . جووره نـانێکی زۆر تەنک و ناسکە پان و خڕە. (دەر.) نانەشینە. مادە.

**هەورامی:** خەڵکی مەڵبەندی هەورامان، شێوەی کوردی هەورامان.*

**هەورانی** (باک.): هاپا.

**هەوراو** (هەو.): گۆلاوی بارانە، گۆلی بارانە.

**هەوراوی:** (باک.): ئەوراوی.

**هەورایی** (ڕۆژ.): برسی بوون.

**هـەورەبان:** سـوانده. ئـەو گـووێ بانەیـە، کەلـەدیواران دروسـت دەبـێ. بانووچکە: بانی خانووی زۆر چکۆلەیە وەکوو بانی سەرپلیکان و ئیتر.

**هەورەبرووسکە** (فە.): هەورەتریشقە.

**هەورە تریشقە** (جا.): برووسکە. (فە.) هەورەبرووسکە، ئەورترشکی.

**هەورس:** دارێکی کێوییە و بێبەرە، هەمیشە شینە و نیو بەژن بڵند دەبێ گوڵی سپی و مۆر دێنێ.

**هەوڕسک:** گیایەکە.

**هەوڕ و هۆڵ** (پژ.): ئاسنجاو، قاپ و قاچاخ.

**هەورنک** (باک): نیمچەدوورگە.

**هەورنگ** (باک.): نیمچەدوورگە. خاکێکە لـە سێ لایانـەوە ئـاو دەوری دابێ. (موک.) ئاوریشم، کە دەستی لێدرێ هەورینگان دێنێ یانی هێزی تروسکەدار خۆ دەنوێنێ.

**هەوروهۆڵ:** کاتێکە هەور و تەپ و مژ وولاتی داگرتبێ.

**هەورۆ:** ئەورۆ، ئەمرۆ.

**هەوروشە** (هەورا.): کەروێشک.

هەوروشە

**هەوری:** سرکەیی، پارچەیەکی ئاوریشمی تەنکـە ئافرەتـان لـەسـەری دەنێن یا بەسەری دادەدەن. (باک.) نێری سێ ساڵانەیە.

**هەوری زرێ:** هەور.

**هەورێشە** (هەورا.): کەروێشک.

**هەوریشم** (هەر.): ئاوریشم.

**هەورینگ:** چلم، برینگ.

**هەورینگان:** بروانە: (موک.) هەورنگ.

**هەوزینگ:** ئاویلکە.

**هەوسار:** لغاو، جڵەو. (باد.) هەڤسار، لڤان، هەفسار. قەوچە، قەڕاسە، سەرکەللە.

**هەوساندن** (باک.): فێرکردن، بهەوسینە.

**هەوسین** (باک.): فێربوون، بهەوسە.

**هەوش:** بزنی سپی و ڕەش، حەوش، حەسار، باخچە، زنج، تامان لە دار بۆ ئاژەک لە دەرەوە.

**هەوشار:** وڵاتێکە لە کوردستان، پەسنی سەگی زۆر باش (سەگی هەوشار). گیاگسک.

**هەوشاری** (زرا.، کە.): وشک، نیشک.

**هەوشان** (کە.، باک.): ئەوشان. گیایەکە. وشک.

**هەوشەنگ** (بار.، کە.): بزنێکی کاریلەمردووە.

**هەوشە:** پەچەمەڕ، حەسار، حەوشە.

**هەوک:** گەروو، گەردن، ئەووک.

**هەوکران:** کولانەوە.

**هەوکردن:** هەڵاَمسان. لە پڕێکا جێگایەک لەلەشی مرۆی بماسێ.

**هەوکردنەوە** (کە.): کولاندنەوەی برین.

**هەوگیان** (هەو.): ژنی شووبرایە، هێوەرژن.

**هەوڵ:** کۆشش، خەبات، تەقەلا، خەفتیاتی، هەڵپە، لۆقە، کوشەوە، پەلەقاژە، تەلاش، چکوچۆ. (سن.) دەستەپارچە.

**هەوڵە:** ئاوڵە، خورێکە، خورویلکە، پشتەماڵ، پارچەی کوڵکنی خۆوشک کردنەوە.

**هەوڵە زلزلە:** ئاگرە.

**هەوڵدان:** خەبات کردن، تەقەلادان، خەفتیان، قەپچاندن، لێ خەفتان، لۆقەکردن، تێکۆشین، شان دانەبەر. زۆر ــ: حەشرکردن، زۆر تەقەلادان.

**هەوڵدەر:** کۆشیار، کۆشەر، تێکۆشەر.

**هەول و دەو** (فە.): سەوداگەری، فریادی، کڕین و فرۆشتن.

**هەولێر:** شارێکە لە کوردستان، کۆنترین شارە کە ژیانی تێدا بەردەوام بووە.

**هەوهەو:** دەنگی سواران لە ڕاودا، وتەی سەیر مان.

**هەویا:** تکا، هێڤی، هیڤە، هێوی، هیوا، ئومێد، هومێد.

**هەویادار:** هیڤەکێشی. ئومێدەوار، دڵڕەق، تکاکار، هێڤیدار.

**هەویان** (باک.): وەرگیراو، دامەزراو.

**هەوێ:** دوو یا چەند ئافرەتێک، کە ژنی پیاوێکی بێ دەبنە ــ ی یەکتری. هەوە، هەوی.

**هەوێسار:** هەوێ بار.

**هەوور:** مزی زۆر بەرزەوە بووگ کە بارانی لێ دەڕژێتە خوار، عەور، شتێکی زۆر نەرمی کون کونە بۆ دەست وچاوشتن کە بەکەفی سابوونەوە وەکار دەهێنرێ، گۆمی قووڵ. مێرگۆڵەی بچووک لە نواڵی چیادا.

**هەوورگەر:** نیرارگەر، کەسێ کە دەفری سواڵەت چێ دەکا.

**هەویەشەو:** مانگەشەو، هەوی شەو.

**هەوێدار** (موک.، بل.): گیایەکە گەزێک بڵند دەبێ و پشتی توکاوی و سپیە گوڵەکانی بەشینی ڕەنگی شینە بەوشکی بۆرە لەنێو دار و باغاندا شین دەبێ.

**هەوێوک** (باد.): مانگەشەو.

**هەوێدی** (باک.): جوورە گەغێکە.

**هەوێردە:** کەلەفر، کەڕەواڵە. باڵندەیەکە لە چۆلەکەی کەمێک گەورەترە بۆر و یەکڕەنگە گۆشتی دەخورێ لەکشت و کاڵ و باخاندا دەژی.

**هەوێز** (هەو.): کۆز. (موک.) پەچە، پەرچە، حەوشە. ئەو جێگایە بەشەو ماڵاتی لێبکەوێ لەبەهار و هاوین و پایزاندا. جێگایەکە لە چۆڵی بەشەو ئاژاڵ و وڵاخان تێدا ڕادەبوێرن.

**هەوێسار:** هەوێدار. ــ ی: (دزە.) هەوێداری، ژیانی ئافرەتێکە، کە خاوەند هەوێ بێ.

**هەوێن:** هاڤێن، هامێن، مایە، شیردان، ئامیان. هیوێن، ئاڤێن، (هەورا.) هامیژن. ــ ی پەنیری: فرسک، مایان.

**هەوی:** مانگ. (باڵ.) هەڤی. نێوی ئافرەتیە. هەوتە، هەفتە. (باک.) هەوێ، ئەوێ.

**هەوێر:** هەڤیر، (هەورا.) هەمیر. (دەر.) پات. ــ پەڕین: (هەورا.) هەمیر پڕان. ــ ترشان: هەڵپرووکان.

**هەوێرترش** (هەورا.): هەمیرترش. هەڤیرترش. هاڤێن.

**هەوێرتێکان:** پەینکە.

**هەوێرکان** (ڕەوا.، خۆ.): ئاردی نێو کەوڵێیە. (سا.) پەیینکە.

**هەوێسەر** (باک.): مەرێکە لموزی خوارێ.

**هەوینگ** (باک.): قامیشەلان دەناوێدا.

**هەوینی** (ئەم.، شکا.): خۆشویستی.

**هەهاء:** ها، ئاهاء.

**هەی:** بەم، ئەی، پیاح.

**هەیا** (باک.): هەتا.

**هەیاران** (کە.): داخوا، ئاخۆ، گەمەیەکە.

**هەیارۆ** (سور.): بالۆرەیەکە کوڕان لێدەدەن.

**هەیاس:** نێوی پیاوییە.

**هەیاسە:** وەکو کەمبەرەیە بەڵان قوبەی وردە وردەی هەیە.

**هەیانی** (باک.): هەتا.

**هەیە:** (دەر.) هەس. (هەورا.) هەن. (باک.) ڤێ هەی، ها.

**هەیتە** (بابا.، کە.): پۆلیس. کوردی پێشوو بە سەربازیان کوتوە ــ تاچاخی بابانەکان، بەڵان لە ڕەواندز بەپۆلیس وتراوە. (کۆ.، ڕەوا.) پۆلیس.

**هەیتێ** (ڕۆژ.): جار، چەل.

**هەیدەدان** (باک.): بەشکۆ، بەرەونەق.

**هەیرۆ:** واه، واها، وی، ویح.

**هەیفی** (کە.): ئەیرۆ، هەمزیا، هەمژدیها.

**هەیڤ** (باک.): (زا.، باک.): مانگی ئاسمانی. لەوێ چواندنی ویدا بۆ جوانان بەکاردەبرێ، ژیکەڵە. ــ برەش: شەوی تاریک. ــ ا چاردە چەڤی

(باک.) مانگی چاردە. ـــ شیو خواریە: مانگ پەنای گرتووە. مانگی ئاسمانی. مانگی (٣٠) ڕۆژییە.

**هەیڤی:** مانگی (سالا هەیڤی دە ڕۆ کێمترن ژ سالێن دن.) *

**هەیڤین:** خۆشەویستی، دڵداری.

**هەیکەل:** پەیکەر، کۆتەڵ.

هەیکەل

**هەینە:** هەینی.

**هەینە هەینە** (ڕۆژ.): بۆ سەرزەنشتی ئەو کەسە دەوترێ، کە درێژ دادڕی و چەنە درێژی دەکات واتا: بیبڕەوە و هێندەی درێژە پێ مەدە.

**هەینۆک** (خۆ.): نینۆک.

**هەینێ** (ڕەوا.، هەو.): ئەوەدەمی.

**هەینی:** ڕۆژی هەینی. دێنی. (بۆتا.) ئینی. (ژە.) ئین، دێن، ئەینی. (باد.) هینی. هەفتە. نێوی نێرینانیشە.

**هەیواسوو:** مانگی ئاسمانی. هەوی بەمانگی (٣٠) ڕۆژی دەڵێن.

**هەیوان:** هەیوانی پێش باڵەخانان. بەربانک، تارمە، دوویانکۆک. (باک.) برایی. (هەورا.، باک.) ئەیوان، ئیوان. (هـ.) بیلاّیی، لیوان. تالار، تەلار.

**هەیوی:** مانگێک. (بۆ مەبەستی ماوە).

**هەیها:** دەیها، هاها، ئاها، لە واقماندا بەکاردێ. بۆ ئاژۆتنی یەک سمان بەکاردێ.

**هەیهاوار:** ئای وای، ئەیداد، وەیداد، ئەیهاوار.

**هەیهای:** پیاح.

**هەیهایە:** وێدەچێ، دەبێ، کوور.

**هەیهە:** کووریهچێ، بۆ ئاژووتنی یەکسمانە و دەنگدانیانە. (کە.) بۆ گل دانەوەی بزنان بەکار دەبرێ.

**هەیهەی:** حەی حەی، بەه بەه، پیاح.

**هەیهۆ:** (خۆ.) هەیهوە. (هەو.) هەیهۆ هەیهۆ، ئایهۆ، لە توورەیی هایهۆ.

**هەیهۆپ** (لەک.، باک.): سەرتاوسی.

**هەیهۆهەیهۆ:** هەیهۆ، ئایهۆئایهۆ. (واتا زۆر زۆر دوور و نەبوونییە).

**هتاف** (باد.): هەتاو، ڕۆژ.

**هتد:** هەتەد: هەتادوایی.

**هجال** (باک.): پەردە.

**هچکار** (باک.): بیباری سوور.

**هدام** (باک.): هەڵکردن، کشان، لا.

**هر** (باک.): ئێرە.

**هراو** (باک.): سەردار، سەرۆک.

**هراندن:** شکان، وردکردن.

**هرە** (باک.): ئێرە.

**هرڕە** (باڵە.، دزە.، دەر.): بۆ ئاژۆتنی مەڕان بەکار دەبرێ. کسسە.

**هرەڤان** (باک.): ڕووخان.

**هرەڤین** (باک.): ڕووخاندن.

**هرە هۆهۆ** (باڵە.): بۆ گێڕانەوەی مەڕان بەکاردەبەن.

**هرمانە:** هاووژی، کار یا بیرکردنەوەی پێچەوانەی کەسێک. *

**هرچ** (ئامێ.، باک.): ورچ.

**هرچەل** (باک.): دەنگی شوومی.

**هرچکی** (باک.): نالایق، ناشیاو، لێنەهاتوو.

**هرس:** هەرس، ورچ.

**هرلس:** هەموو.

**هرمز** (باک.): هۆرمز، خودا.

**هرمزک** (باک.): قابێکی کوردییە.

هرمزگان

**هرمزگان** (باک.): مزگەوت.

**هرمزین** (باک.): گەیشتنی میوە، نەڕاندن، چریکاندن.

**هرمێ** (باک.، باد.): هەرچی.

**هرهر** (دەر.): بۆ ڕاوەستاندن و ئارامی یەکسمان و مەڕانە.

**هرێ** (هەر.، باک.): ئایا، ئەرێ.

**هرێز** (فە.): فریزوو.

**هرێن** (باک.) زەڕەی ئێستری.

**هریی** (یە.، باک.، هەر.): خوری.

**هرینی** (باک.): قوماش لە خوری.

**هریشک** (باد.): میوانی چێشت، دۆو ساواری خرە وشکی دەکەنەوە.

**هزارە:** ئاسنێکە چتی گرانی پێ بڵند دەکرێ

**هزر** (باد.): بیر، یاد.

**هزیران** (باک.): مانگی شەشەمی زایینی، لە بیست و یەکەمی مانگی بانەمەڕەوە تا سی و یەکەمی جۆزەردان. داری خەیزەران. (باک.) ـــ ی: جوورە هەرمێییەکە.

**هژان** (باک.): جوولان، بزووتن.

**هژاندن** (باک.): هەژاندن، جوولاندن.

**هژمار** (باک.): هەژمار.

**هژمارتن** (باک.): هەژماردن.

**هژیان** (زا.، زێ. هەر.): هەنجیر.

**هژیر** (باد.): هەنجیر.

**هسە** (باڵ.): بۆ لێخوڕینی مەڕان بەکار دەبەن. (کە.) کسە، قش.

**هش** (باک.): هۆش، بێداری. بێ ـــ: (باد.) بێ هۆش. بێ ـــ ی: بێ هۆشی.

**هشازا:** چاوقووچێن، لێ بوور، بەخشەر، چشم پۆش.

**هشفتن** (باک.): قووت دان، ڕۆهێشتن.

**هشبر** (باک.): هۆش بڕ.

**هشدار** (باد.): هەستیار.

**هشتن** (باک.): هیشتی.

**هشفەکری** (باک.): دڵ کراوەوە، سنگ فراوان.

**هشک:** ووشک.

**هشکەبەر** (باک.): خانوو بەرەیەکە بە ووشکە بەردان دروست کرابێ.

**هشکەلی** (باک.): دەمی، کاتی، ئاشی ــ: ئاشی کاتی و کەم ئاو.

**هشکەسایی** (باک.): هەوای سارد و ڕوون.

**هشکهەرە** (باک.): پوولی زێڕ یا زیو.

**هشکلنگ** (باک.): ئیفلیج، دەردێکە بگاتە هەر جێگایەکی لەشی، بێ هەستی دەکات.

**هشکوور** (باک.): قووڵ.

**هشکۆکە** (باک.): هەرمێ کێویلکە.

**هش هش** (کە.): حەلەلەلە (بۆ بە شەڕدانی سەگان بەکاردێ).

**هشیار** (فە.، باک.): هۆشیار، وشیار.

**هەمبەران** (باک.): ڕووبەڕوو.

**هەمبێز** (باک.): ئامێز. ــ کرن: لەئامێزکردن.

**هەمهەم** (باک.): وەرەم، هەڵاّمساو.

**هلەهاتن** (باک.): هەڵاّتن.

**هلبەرتاندن** (باک.): دڕاندن، فڕاندن.

**هلبەرین** (باک.): هەڵپەرین.

**هلبەکاندن** (باک.): قەڵەشاندن، پارچەپارچەکردن.

**هلبەکین** (باک.) پارچەبوون.

**هلبەسارتن** (باک.): هەڵپەساردن.

**هلپچاندن** (باک.): جوون، جووین.

**هلپفاندن** (باک.): تەکاندن، خاوێن کردنەوە بەتەکاندن.

**هلچەنین** (باک.): ڕاچەنین، هلچەنە، ترسان.

**هلچکاندن** (باک.): تێکەڵاّوکردن.

**هلچناندن** (باک.): هلچنینە، بادان. کەڵەکەکردن لەسەر یەکتری بەبڵندی.

**هلچنین** (باک.): هلچنە، بادران.

**هلتەقاندن**: پارچەپارچەکردن، هلتەقینە.

**هلتەقین** (باک.): هلتەقە، پارچەپارچەبوون.

**هلدان** (باک.): هلدە، هەڵدان، بڵندکردن.

**هلستاندن** (باک.): هەڵستاندن، وەئاگا هێنان، ئامادەکردن.

**هلستە** (باک.): ئامادەیە.

**هلستن** (باک.): ئامادەبوون.

**هلقەتاندن**: لابردن، سڕینەوە. (باک.) دڕاندن.

**هلقەوستن** (باک.): هەڵبەزین، قەڵەمبازدان.

**هلقەتین** (باک.): دڕان، لێ فڕێدان.

**هلفڕاندن** (باک.): هەڵفڕاندن.

**هلکەواشتن** (باک.) گۆڕین، گوێزتنەوە.

**هلفڕین** (باک.):هەڵفڕین.

**هلکەتن** (باک.): چوونەسەر، هەڵکەوتن.

**هلکەهلک** (باک.): هانکەهانک، تەنگەنەفەس.

**هلکرن** (باک.): هلکە ــ: لەڕیشە هەڵقەندن، ریشەکەن کردن.

**هلکشان** (باک.): هەڵکشان.

**هلکشاندن** (باک.): هەڵکێشان.

**هلگەفتن** (باک.): شۆڕش و یاخی بوون، سەرکێشی کردن، بڵندکردن.

**هلگەڕاندن** (باک.): نیو، نۆبەت گرتن.

**هلگەوستن** (باک.): گوێزتنەوە، گۆڕین، هلگەڕێسە.

**هلگرتن** (باک.): هەڵگرتن، هەڵێنان.

**هلم** (باک.): هەڵم، دەراوسێ یەتی.

**هلماشتن** (باک.): هەڵکردنی قۆڵ و شمشێران.

**هڵمسین** (باک.): دەست لێدان.

**هلمشتن** (باک.): هەڵکردنی قۆڵ.

**هلناندن** (باک.): بڵندکردن.

**هلنگفین** (باک.): پێ هەڵکوتن.

**هلۆڵ**: هوولۆڵ.

**هلووس**: لووس.

**هلوو** (باد.): لووس، (باک.) هلووس.

**هلوەشاندن**: وێرانکردن، فڕێدان، خراپکردن.

**هلهاتن** (باک.): هەڵاّتن، بڵندبوون.

**هلهلاندن** (باک.): بهلهلینە، دڕاندن، پارچەکردن، بەکاربردن.

**هلهلۆک** (باک.): دارە.

**هلهلین** (باک.): دڕان، بەکاربردن.

**هلی** (باک.): زان لە کاتێکی باشدا (بۆئاژاڵان).

**همی**: هەموو، گشت.

**هن** (باک.): ئەنگۆ، ئێوە، هێندێک. هن جار: هێندێک جاران. (فە.) هی، ئی.

**هنار** (باک.): هەنار.

**هنارتن** (باک.): ناردن.

**هنارک** (باک.) کوڵمە، خڕ، کوورە.

**هناری** (باک.): گەروو گیران لە گریانی دا.

**هناڤ** (باک.): هەناو، زگ.

**هنە** (باک.): خەنە.

**هنەر** (باد.). هونەر.

**هنبەر** (باک.): ڕووبەڕوو.

**هنبیکی** (باک.): جوورە دار هەرمێیەکە.

**هنجان** (باک.): گوڵدان، ئینجانە.

**هنجانە** (فە.): مەنجەڵ.

هنجانە

**هنجاندن** (کە.): ئەنجنین.

**هنجراندن** (باک.): تالّووکەکردن، ڕێک کووشیان.

**هنجرین**: هنجنین، ئەنجنین، ونجرونجرکردن.

**هند**(باک.): هەند، هەندێک. ــ ێ گەورە، ــ ی ڕەش، ــ ێ زەر، کن، لا.

**هنده**: هێنده، بەقەدەر.

**هندک** (باک.): کەمێک. ــ کردن: کەم کردن. ــ بوون: کەم بوون.

**هندی** (باک.): ئەودەمی، ئەو وەختی، هەنگینی.

**هنک** (باک.): هێندێک، چەندێک. فێنک.

**هنکا** (باک.): هێندێکان.

**هنکی** (باک.): نەختێ، بەشێکی زۆرکەم لە چتێک.

**هنگ** (باد.): ئەنگۆ، ئێوە. (باک.) نێوان، ناوچە. (کە.) فم. ــ کردن: فم کردن، چلْم فڕێدان.

**هنگا** (باد.): وەختی، دەمی، کاتی.

**هنگافت** (باک.): لەپاشان، لەو دەمی دا، ئەو دەمی.

**هنگافتن** (باک.): بهنکیڤە، ئەنگاوتن.

**هنگافن** (باک.): هنگافن، ئەودەمی.

**هنگرتن** (باک.): هەڵگرتن.

**هنگڤ** (باک.): هەنگوین.

**هنگڤی** (باک.): هەنگوینی.

**هنگڤین** (باک.): تووش بوون، هەلەنگوتن، هەنگوین.

**هنگ و دەنگ** (باک.): دەبدەبە.

**هنگو دینگ** (باک.): شکۆ.

**هنگووری** (باک.): ڕووناکی دوای ئاوابوونی ڕۆژ. سەر لەئێوارە تا نیوە شەوێ.

**هنگوڤ** (چی.): هەنگی ولاّخانە.

**هنگوستۆک** (باک.): ئەنگوستیلەی دروومانی.

هنگوستۆک

**هنگووستیل**(باک.): ئەنگوستیلە، هنگولسیک.

**هنگێ** (باک.): ئەودەمێ.

**هنگی** (باک.): هەنگی، ئەودەمی.

**هۆ**: (باد.) ئەگەر. بەرێگای، بەرێ ی. بۆ ڕاگرتنی ولاّخی بەرزە بەکار دەبرێ. یەهـ. (موک.) هۆی (بۆ بانگ کردن بەکاردێ). ــ بابە: ئۆبابە. سەر: هۆ بۆ دیتنەوە: سەر بودتنەوە. دەستاوێژ، دۆز، بۆنە، مایە، توور، سوێکە، ناوەندی، (هەورا.) ناوەنی، ڕوو، سۆنە. بە ــ: (باک.) بە، بەر، بەهۆی ئەوەوە. لەبەرتۆ: بەرتۆ. بە ــ: لەورا، ژوی، لەو. قازانج، سوود، ماف دانەوە، هەو. (شا.) قبراغ، بۆنە، مایە، پێویستی، نەخۆشی. (باک.) هۆ. ــ بوون: هێن بوون، ئاوا، وەها، هۆتوو.

**هۆئش** (هەو.): چۆش، ئۆش. بۆ ڕاوەستاندنی کەر و ئێسترانە.

**هۆباو** (هەو.): بابە، برام (لەئاخفتن دا).

**هۆبە**: دەستە ڕەشماڵێکە. (باک.) ئوب، ئوبە. (هەر.) زۆپە، زۆمە، زووم، کوورەنگ.

**هۆپ** (ڕۆژ.، کە.، هەو.): ڕاوەستە.

**هۆپن**: خرین، ئەستوور و درێژی لاق.

**هۆپهۆپک** (را.): پەپووسلێمانکە.

**هۆت** (دەر.): واق. ــ بوون: سەر سووڕمان.

**هۆترک**: هۆڵمان.

**هۆتۆ**: ئەوا، ئاوا، وا، بەوجوورە، بەوچەشنە، ئەوتۆ.

**هۆتۆیی**: ئەوتۆیی.

**هۆجە** (ئەردە.): دۆخین.

هۆجەنەکێش: دار دۆخین.*

**هۆحە** (کە.): وشەیەکە جۆتێران لەکاتی جووت دا بەکاری دەبەن.

**هۆخ** (باک.): دەرکی چکۆڵە.

**هۆد** (باک.): هاون، ئاونگ، دەسکاونگ.

**هۆدار** (باک.): گیایەکە پێ هەڵدەچێ.

**هۆدانەوە**: وەفابوون، قازانج پێگەیاندنەوە، تۆڵەدانەوەی چاکە، دفتان. هەوردانەوە. بادانەوەی جووتە لە دوای خەتی جووت. (گەڕاندنەوەی جووت).

**هۆدیەڤە** (ئامێ.): دەستی پێکردەوە.

**هۆدە**: چاوە، ژوور، دیو.

**هۆدەج** (باک.): کایەکە بەژێر پێ ی ولاّخان دادەکرێ.

**هۆر ئێستەی** (هەورا.): هەڵستان.

**هۆڕ**: (فە.) هەوور. (جا.) تێڕ. هاوالّی جەوالّی. (خۆ.) هۆش. لە ــ چوون: لەهۆش چوون. (شەبە.) خەون. (باک.) باڵندەیەکە. قابلی هەڵڕواندن و کردنە تۆز و پان کردن. جاوی. ــ کردن: زۆر پێگەیاندن، زۆر لێ پەیداکردن.

**هۆڕڕ**: جەوالّی زۆر گەورە.

**هۆراسان** (هەورا.): هەویر هەلاّتن.

**هۆرە**: سنگێکی دارێکی تیژ و کورت و چکۆڵەیە لەداری بی دەقەلەشرێ. (شا.) پوواز. (کۆ.) زەمۆمە. (بار.) سپێنە. (جا.، شارە.) گۆرانییێکە. (خۆ.) پۆز، غیرەت، کەیفەرات، دەمار. بێ ــ یی: بێ غیرەت. (هەو.) مرازێکی تەونی یە.

**هۆرپەرای** (هەورا.): هەڵپەڕین.

**هۆرت**: سەیر، سەمەرە، دروستکراوێکی سەیر.

**هۆرتەهۆرت** (کە.، ڕۆژ.): لۆقەلۆق. (ڕاکردنی ناقۆلاّو نارێک). هۆڵتەهۆڵت.

**هۆر خلیسکیای** (هەورا.): هەڵخلیسکان.

**هۆر دارای** (هەورا.): هەڵدان، بۆ ئالاّو خێوەت و چتی تر.

**هۆردوو**: ئوردوو، لەشکرگا، (هـ.) هۆردی.

**هۆردووبەز**: لەشکرگا.

**هۆردی** (هـ.): هۆردوو، لەشکر.

**هۆر تروشکیای** (هەورا.): کرووژم هەلاّتن.

**هۆر تروشکنای** (هەورا.): کرووژم هەڵێنان.

**هۆرزان** (هەورا.): هەستان، هەڵستان.

**هۆرزە** (هەورا.): هەستە، هەڵستە.

**هۆرزدێ** (هەورا.): هەستن.

**هۆر زنای**، هۆرێرزنای (هەورا.): هەستاندن.

**هۆرستەی** (هەورا.): هەستان.

**هۆرش قۆڕنی** (هەورا.): هەڵقوڕاندن.

**هۆرشێن** (هەورا.): هەڵچوونی چێشتی.

**هۆرک**: (باد.) وورد.

**هۆرکزانن** (هەورا.): هەڵکزاندن.

**هۆرگە**: یانە، باخچەی میللی، ئەنجومەن، هەڤجڤان.

**هۆرگران** (هەورا.): ناییسان، داگیرسان.

**هۆر گرتەی** (هەورا.): هەڵگرتن، وەرگرتن.

**هۆرگیلای** (هەورا.): وەرگەڕان.

**هۆر گێڵەوەن** (هەورا.): بگەڕێوە.

**هۆرگێڵنای** (هەورا.): وەرگەڕان.

**هۆرم** (شەبە.): خەون.

**هۆرمز**: پەرچیس، بەرو. ئەستێرەی مشتەری یە. نێوی کوڕی ئەنوشیرەوانی کوڕی بەهمەنی یە. نێوی یەکەمین ڕۆژە لەهەموو مانگێکی ڕۆژی (شمسی) دا.

**هۆرمزگان**: مزگەوت.

**هۆرمیس**: فرمێسک.

**هۆرمیسک** (دەر.): فرمێسک.

**هۆرن**: گۆمێکە لە نێو دەشت یا کێواندا، کە زۆر قووڵ بێ و ئاوی لەبەری بڕوا یا نا، بەڵام نابێ وشک بێ.

**هۆرنن**: خوێندن.

**هۆر وەزنای**: پێ هەڵچوون. بە دار و دیواردا چوونە سەرەوە.

**هۆرۆگێلیای** (هەورا.): وەرگێران.

**هۆرێزان** (هەورا.، زەن.، کۆن.): هەستان.

**هۆرێزای** (هەورا.): هەڵستان.

**هۆریزنای** (هەورا.): هەستاندن.

**هۆرێشە** (هەورا.): ڕێوی.

**هۆرین**: دەنگ، گرمە. ـــ ا ئەورا: گرمەی هەوری.

**هۆرینە** (لک.): شوێنێکی تایبەتی یە بۆ وورده ئاژاڵان، کە نەخۆش بن یا بێ تاقەت بن.

**هۆز**: نەتەوە. هۆبە. ئیل، خێل، خێڵ. (باک.) خەراج. خێڵسات، کۆچەر، ڕەوەند، خانەوادە، فامیلە. (ڕۆژ.) دێ، گوند.

**هۆزانڤان** (باد.): بوێژ، هەستیار.

**هۆزەبانە** (خۆ.): گوێزەبانە.

**هۆزەلاو** (سەر.، موک.): گیایەکە.

**هۆزێتی**: ڕەگەزێتی، خێڵەکی.*

**هۆژان** (خۆ.، کۆ.): مەشق، بزوتنەوە و جوولان.

**هۆژانەوە**: بزووتنەوە.

**هۆژاندن** (خۆ.): مەشق کردن، بزواندن.

**هۆژانگە**: شوێنی مەشق کردن.

**هۆسە** (باڵ.): هەر وەکوو.

**هۆستەی** (هەورا.): هەڵستان.

**هۆستون**: ئەستوندەی خێوەت و چادرانە.

**هۆسین**: سووانەوە، سوواندنەوە.

**هۆش**: جۆش، ش. زیرەکی. هۆر. وە ـــ هاتنەوە: وەخۆهاتنەوە. بێ ـــ بوون: لە خۆچوون. (باک.) ئاریش. منە. زی، هش، بیر، ژیری. (باک.) بۆر. بزنێکە تووکی ڕەش و خاڵخاڵ بێ. بۆ ڕاوەستاندنی کەر بەکاردێ.

**هۆشە** (جا.): هێشوو. گوڵەگەنم.

**هۆشمەنگ**: زانا، زیرەک، پەند. نێوی پیاوانە. منداڵ مردوو.

**هۆشبر**: هشبر.

**هۆشدار**: تێگەیشتوو، زیرەک، زرنگ. بە هۆش، هۆشمەند. وتوو وریا. (باک.) ئاریشەن. بیرەوەر. نێوی پیاوانە.

**هۆشداری**: بیرەوەری.

**هۆشیار**: بیرەوەر. ـــ ی: ئاگاداری.

**هۆشینە**: بیرەوەخەر.

**هۆڤ** (باک.): کێوی. درندەیی. چاوسەخت.

**هۆقاندن**: دەنگی گامێشی یە. ڕشانەوە.

**هۆقە** (هەو.): دەنگی گامێش، حۆق. سەنگێکە بۆ شت کێشان.* (موک.) دەنگی کەڵ و گامێشی یە.

**هۆک** (کە.) جەنە. (سن.) ئارەزوو. (باک.) کاکەشان، ڕێگای کاکێشان لە ئاسمانی دا.

**هووکارەبوون** (فە.): فێربوون.

**هۆکەر** (باک.): ڕێکخەر.

**هۆکەڵ** (تیلە.): هەڵکەوتوو.

**هۆکدار** (کە.): واژی، بەروازی، ئاوەژوو.

**هۆکۆرە** (فە.): فێربوون.

**هۆکهۆک** (باک.): باڵندەیەکە.

**هۆکێ**: تۆلاز، نێری، کە زۆر دەوری مێونە دەدا.*

**هۆگ** (باک.): نرخدار.

**هۆگان**: جێگایەکە جووتی لێ دەگیرێتەوە. سەدە. دە لات. گاوەخان. سەردێر، سەرمەرز. گاگێرەوە.

**هۆگە**: دێخوون، هۆجەنە.*

**هۆگەج** (شکا.، باک.): بەرانی خەساوی سێ ساڵانە. بەران.

**هۆگەگ** (باک.): تۆپ، گووڵەی دار.

**هۆگر**: ئۆگر، هاوڕێ، برادەر، دەستەمۆ. ـــ بوون: ڕاهاتن، ڕام بوون. ـــ ی: ئۆگری.

**هۆگرنەگرتوو**: نامۆ، نەیان.

**هۆگۆرج** (باک.): بەرخی دووساڵانەیە. شەک.

**هۆڵ** (باک.): گرنگ. دیوەخان. (هەورا.) گەوڕ، گەلەخان. خۆکە، هەل، ئاغەل، ئاخەڵ، گۆڤ، پشتیر، گۆم. (ئەردە.) نەگبەت. تەویلەی ماڵاتی ورد (مەڕ و بزن). (باک.) گۆی مەیدانی و گۆی گۆیینی. قەڵەمنداژ. ـــ

کردن: تەزەکردن. بەتاڵ. (موک.) ـــ کردن: بردنەوە لە تۆپێنی دا. (کە.، ڕۆژ.) خەمخۆری. ـــ لێهاتن: خەمخۆری کردن.

**هۆلاک:** هۆلمان.

**هۆلالی** (باک.): گوێتێی.

**هۆلانی** (بار.): قاشوانێ، جورە گەمەیەکە لە نێوان دوو دەستە.

**هۆلەمار** (موک.): شارەمار، هەلەمار.

**هۆلە** (ڕۆژ.): گیرە، جۆخین کوتان.

**هۆلۆچ:** شەک.

**هۆلە:** دەنگی گریانی.

**هۆلەموز** (هەورا.): تێکوڵە شینەکەی گوێزی تەڕە. (هەورا.) کەمکۆڵەوز. (ڕەوا.) ڕەزەڵە. تێکوڵە شینەکەی گوێزی تەڕە.

**هۆلەهۆل:** دەنگی لێخوڕین و بانگ کردنی گوێرەکە. دەنگەدەنگی بە گریان.*

**هۆلتەهۆلت** (ڕۆژ.، کە.): ڕاکردنی ناقۆلاو ناڕێک. لۆقەلۆق.

**هۆلک** (باک.): کوخ، کلبە، چارداخ، سەکۆ، بڵندکردن بۆ کێشکی باخچان.

**هۆلکڤان** (باک.): شوان، باخەوان.

**هولێ** (باک.): وەکو، هەروەکو.

**هۆلمان:** هۆلاک، هۆترک.

**هۆڵێن** (کە.): شەقێن، گۆیێن (گەمەییەکە).

**هۆلی:** جاشک.

**هۆلی** (باک.): تۆپێن.

**هۆما** (زا.، دەرس.): خودا، یەزدان.

**هۆزان** (زا.، دەرس.): زانا، پیتۆڵ، فەیلەسوف.

**هۆم** (خا.): سنوور، تخووب.

**هۆمان:** سەرکردە، فەرماندار، پێشدار. نێوی پیاوانە.

**هۆمە:** هومە، کووپە.*

**هۆن:** هۆنەر، بوێژ، (باک.) ئەنگۆ. بڕوانە: جار.

**هۆنان:** هۆنران.

**هۆنراو:** هەڵبەست، شیعر، گۆریاو.

**هۆنانەوە:** هۆنینەوە.

**هۆنراوە:** هەڵبەست، شیعر.

**هۆنراوەوە:** گۆرتە، گۆردم.

**هۆناندن** (باک.): چنین، هۆنینەوە.

**هۆنە** (ڕۆژ.): هاتنی با.

**هۆنەر:** بوێژ، شاعیر.

**هۆنژین** (باک.): باوێشک.

**هۆنک** (باک.): فێنک.

**هۆنکاندن** (باک.): ئارام کردن.

**هۆنکین** (باک.): هۆنین، هۆنان.

**هۆنن** (زمن.): خوێندن.

**هۆنین:** گۆریان، هۆنکین.

**هۆنینەوە:** ڕێکخستن، پێوەکردن، هۆنانەوە، هۆناندن.

**هۆوڵە:** دەنگێکە بۆ گەڕانەوەی وڵاخ و گاجووت.

**هۆو:** ئێ، هی، هیا. (بۆ دوورە). ـــ پیاوە هێ. بەڵێ. بۆ لێخوڕینی وڵاخان بەکار دەبرێ.

**هۆوانە:** ئەوانە.

**هۆهۆهۆ** (هەر.): بۆ بانگ کردنی مەڕانە و، بۆ گێڕانەوەی مەڕان و بزنانە. بۆ جوتیش بەکار دەبرێ.

**هۆهۆی:** ئەرێ هۆی.

**هۆوە:** بۆ دوورە: ئەوا هێ.

**هۆ وەتا:** ئانە، ئانەنە: ڤا، ڤایە: واهە: وە.

**هۆیتە** (ڕۆژ.): خەو.

**هۆوەتانێ:** ئانەنە.

**هۆوایە:** لایەکی دوور و دیار نیشان دەدا.

**هۆیتن** (دا.): وتن، ئاخافتن. (ڕۆژ.) نوستن.

**هوێر** (ڕۆژ.): ڕۆژ، خۆر.

**هۆی:** هۆ، ئۆی، هێ ی، های، کوڕە، ئەرێ. بۆ دەنگ دان و ئاگادارکردنەوە و بانگ کردن بەکاردێ.

**هۆیها:** هەلەلەلە، دزیها، حەلەلەلە. کەسەگ لەسەگ یا گورگی بەر درێ ـــ دەڵێن.

**هوور:** کەم هۆش.

**هویرە** (ڕۆژ.): ورە، هورە.

**هویزی** (باک.): داردەست. چۆماغێکی گرێ یاوی زۆر ئەستورە.

**هوێلانن** (ڕۆژ.): ون کردن، گووم کردن.

**هوێلیا** (ڕۆژ.): ون بوون.

**هووت** (باک.): نووک، نوو، بوونێکی سەیر.

**هووتسا** (باک.): خاوەند ڕەوشتێکی سەیر و جیاواز لەگەڵ سروشتی.

**هووتک** (باک.): نوختە، جێگا.

**هووخ:** ڕووگە.

**هوودە:** سوود، قازانج.

**هوودرە** (هەورا.): جورە مێشوولەیەکە لاق و چزووی درێژە.

**هوورکرن:** بەرهەم هێنان بە زۆری.

**هوور** (باک.): ورد، هووردە، هوورد.

**هووڕ:** وڕ، گێژ، هێڕ، تۆلاز، گێل، حۆل، گەوج. پ. خوڕەمەی باران.

**هووار:** شاباش، چەپڵەڕێزان.

**هوورە** (باک.): لاسکی چلەپووشکە. (کە.) ورە، هویرە.

**هوڕە** (ڕەوا.): دەردێکە لە میوەی دەدات. (هەمو.) ڕەشەبا. مێشوولەیەکی گەورەیە.

**هووڕە:** ـــ بوون، سەبین، ورە. بای بەهێزە لە دەمی گەرما یا سەرمادا بێت. ڕەشبا. بۆ چتێکیش بەکاردێ، کە بەپەلە و توند و تیژی تێپەڕێ. وا ڕۆیشت ـــ ی هات. بە گرمەی باو هەوریش دەڵێن، گیایەکە گەڵایەکەی وەکو مێکوکی وایە زۆر تاڵە.

**هووڕەم:** مێگەل. بۆ بەراز و ئیتر.

**هوورد:** وورد.

**هووردە** (فە، هەو.): وردە، بۆ دەغڵ و هەموو چتێکی. دەغلێکیشە گێرە کرابی، بەڵام شەنە نەکرابی. تارم، تارمە. (جا.) مێشوولە. کەسێک زۆر سەرنج بداتە شت و زیرەک بێ پێ ی دەڵێن: پیاوێکی هووردە. یا بە لەش بچووک بێ هەردەڵێن ـــ .

**هووردەفرۆش:** ووردەفرۆش، هوردەواڵەفرۆش.

**هووردەوات** (باک.): خوردەوات، وردەواڵە. هووردەواڵە.

**هوورزەی** (هەورا.): هۆستەی. (فە.) ووسان. هەوورزە: هەستە. (فە.) هەڵس.

**هوورک** (باک.): پوولی وردە، پارە و دراوی ورد. (باک.) پەرە، پارە، زۆر چکۆڵە.

**هوورکە:** ورتکە. منالّی بچووک.

**هوورکەتەی** (هەورا.): هەڵقەندن.

**هوورک مموورک:** ورتک و مرتک.

**هوورگ:** ورگ، زگ.

**هوورم** (زەن.): خوڕەمە بارانە. بارانێکە زۆر بەهێز بێ و بە خوڕەمە بباریّ.

**هووروۆژان:** تێ وورووکان.

**هورۆژان** (هەورا.): خرۆشان، تێوەرووکان، (کە.) هۆژان.

**هورۆژی** (هەورا.): خرۆشین.

**هوورووش** (دەر.): برۆیش.

**هوورووژم:** هێرش.

**هوول:** سوورهول. مرۆی ڕەنگ سوور.

**هوروو موور** (باک.): کەل و پەل و پێداویستی سەفەر و کۆچ کردن.

**هووری:** گێلی، گێژی، حۆلی، تۆلازی. (باک.) ئاوڵەی چکۆڵە، خرۆیرکە.

**هوورێنە** (هەو.): وورێنە.

**هووزە:** زۆر بوونی جانەوەران یا کۆبوونەوەیان لە شوێنێکی.

**هووزەم:** پۆلی مێروولان.

**هوزم:** تەکان دان.*

**هوزووم:** هێرش، پەلامار، هاتنەسەر، شالاو.

**هووسا** (زا.): ئاوا، وەکو، وەها، ئەوها.

**هووسەری** (ژا.): هەڵستان.

**هوستوون** (دەر.): ئەستووندە.

**هووس هووس** (هەر.): بۆ گێڕانەوەی مەڕان بەکار دەبرێ.

**هووشە** (ئاو.): گوڕەکردن، خۆ هەڵکێشان.

**هووشەک:** گوڕ هەڵکەن.

**هووشەکەر:** خۆ هەڵکێش.

**هووشەگەنم:** گوڵەگەنم.

**هووشی** (باک.): هێشوو.

**هووشیار:** وشیار.

**هووفەهووف** (باک.): هاشەهاش و سجولانی شەپۆلان.

**هوولە** (ڕۆژ.): مەبەس لە ئەندامی شەرمی ئافرەتانە. (کە.) کۆمەڵێک، دەستەیێک. (موک.) خوولە، ڕەشەولاخێکە زۆر قەڵەوبێ و غرووربێ. (باک.) بووغ، گابووغ.

**هووڵە** (هەورا.): پروانە: مڵە.

**هووڵفک** (باک.): باڵندەیەکە.

**هوولۆس:** ترووسکەدار.

**هووڵۆڵ:** هڵۆل، کلۆر، نێوبەتاڵ، بەتاڵ.

**هوولۆشە** (هەورا.): برۆیش.

**هوولۆلی** (باک.): نیگەران، ترسەنۆک.

**هوولوو:** دارێکە بە بەرەکەشی هەر ـــ دەڵێن، هەروو. ـــ ی کێوی: هوولوو ترشک. (هەورا.) برۆ، هەرۆ. (هۆ.، مزو.) هەستە.

**هوولو** (باک.): زۆر گورج.

**هوولوو:** هەستە. (باک.) هووتوو. ـــ کردن: مشت و ماڵ کردن.

**هوولووترشک** (باک.): هوولووی کێوی.

**هوولووس** (باک.): تروسکەدار، درەوشەر.

**هوولووکەر** (باک.): چەرخ لێ وەرگێردەر.

**هوولهوولی** (باک.): حولحولی، سەرەڕۆ.

**هوولیمە** (باک.): گوڵە مێخەکی کێوی یە.

**هوما** (هەورا.): هێشتا.

**هوومایی:** مەرمەڕشا. (باد.) باڵباتی. بلووری. (دزە.) شاخ بیزی.

**هوومە:** کووپە.*

**هوومێد:** ئومێد، هیوا، هەویا، تکا، دڵڕوونی. بە ـــ: دڵڕوون. نا ـــ: دڵسارد، دلسار، دڵسووتاو. نا ـــ بوون: دەست لێ شوشتن، دەستێ خوە لێ ساردبوونەوە. نا ـــ: رووسار، رووسارد، کەوەڕی.

**هوومێدەوار:** بە ئاوات.*

**هوومێن** (باک.): کۆمەڵە، تێکەڵ، تووانەوە.

**هوومێو** (سەر.): گیایەکە دەخورێ.

**هوون** (باک.): ئێوە، ئەنگۆ، فێنک. (فە.، کەل.) پرچی هۆنراوەوە. (هەورا.) خوێن.

**هووناو:** خوێناو، ئاوی قاورمە.

**هوون ئەسێن** (هەورا.): خوێن ئەستێن، خوێن گر.

**هوونەر:** کارزانی، هنەر، زانست، زانیاری، جەوهەر. بە ـــ: جەوهەردار، بە جەوهەر.

**هوونەرگە:** هوونەرخانە.

**هونەرمەند:** کارزان، مەحلان، وریا، زیرەک، کارساز، پیش پیشە، ڕەنگین، زاڵ، جەوهەردار، (باک.) پالەمێر، جەرجەهە، ئاخوەوەند. (هەورا.) هوونەرمەن. ــ ی (باک.): پالەمێری، ئاخوەوەندی.

**هووندا** (باک.): ون، وندا.

**هووندور** (باک.): نێو، ناو.

**هوندوڕ** (باک.): لەناو دوڕ.

**هوونک** (باک.): فێنک.

**هوونگ** (باک.): هوون، ئێوە، ئەنگۆ.

**هووهە** (کە.): بۆ گێڕاندنەوەی گا بەکاردێ. وۆحە.

**هوێتە** (ڕۆژ.): خەو.

**هوێتن** (ڕۆژ.): نوستن، خەوتن.

**هوییتن** (ڕۆژ.): ووتن، ئاخاوتن، گوتن.

**هویتن** (دا.): وتن، کوتن.

**هوێر** (ڕۆژ.): ڕۆژ، خوَر. ــ ئاوا: ڕۆژئاوا. خۆ هوێرم وەی وتم: خۆم پێم ووت.

**هویر** (ڕۆژ.): بیر، یاد.

**هوویرا** (باک.): ورد، بیر.

**هووێرە** (ڕۆژ.): وورە، هورە، زەهلە، ئاریشەن.

**هووێلانن** (ڕۆژ.): بزرکردن، گوم کردن.

**هووێلیا:** گوم.

**هووێلیان** (ڕۆژ.): گوم بوون.

**هویلیان:** ون و ئاوابوون.

**هێ** (هەو.): بێ، بێجگە. ــ لەوی: بێ لەوی. هەو پیاوێ هێ: هەو پیاوێ هەنێ. (شەم.) هێدی. (باک.) هێشتا.

**هێکای** (شوا.): هێدی، ئەسپایی، لەسەرەخۆ.

**هێجبی** (جا.): خوازبێنی. ــ کار: خوازبێنی کار.

**هێجوو** (جا.): خوازبێنی.

**هێجە:** تەگەی مامز و ماسی یە.

**هێجوبی:** خوازبێنی کردن.

**هێچ** (باک.): تەگە. ــ بوون: بەتەگەبوون (بۆ ئاژاڵان).

**هێچک:** قۆل. (ڕەوا، هەو، دزە.) زەنگولە. (کۆ.) قافکە. (بان، سەق.) چەڵەمە. (دەر.) چاکڵ. (باک.) پتێک (هێندەی بە دوو یا سێ قامکان).

**هێچی** (باک.): گراوی، هەوا، تەگەی مالاّتان.

**هیچی دی:** چیتر، چیدیکە، چی دی.

**هێت** (باک.): ڕان (نی لەش).

**هێتم** (باک.): ئەستێرەی هێتمی، جەمسەری. دەغدان، مەگەنێ ئەزمێن.

**هێتیو** (هەو.): هەتیو.

**هێتیتو چەکە** (هەو.): هەتیوچە.

**هێدم** (خۆ، دزە.): داڵغە. ــ گرتن.

**هێدی:** هێپکایی، ئەسپایی، لەسەرەخۆ. بەکاوەخۆ. ــ بوون: هێ، هێول، هەدنین، هەدرین. ئارام گرتن، حەجمین، تەبتین. هەدادان، سرەوتن. پیاوی ــ: هێمن، گەوشەک. شێنە، هێواش، (باک.) بێ پێژن.

**هێدی هێدی:** وار وارە، لەسەرەخۆ.

**هێڕ:** گێل، بێ مێشک، گێژ، حۆل، دەبەنگ، خوێڕی، پەتیارە، گێژ و وێژ، وڕ. ــ ە بۆ نێرانە. ــ ی بۆ مێ یان لە دوواندندا. ــ ی: گێژی، دەبەنگی، وڕی، سەرسامی.

**هێڕان** (باک.): هاڕان.

**هیڕاندن** (هەو، باک.): باڕاندن، دەنگی بزن و کاریلانە.

**هیڕاندن:** گۆڕین.

**هێڕە** (باک.): میزە. ــ کردن: میزەکردن، تەماشاکردن.

**هیرەق** (ڕۆژ.): هەستان و ڕەق بوونی ئەندامی شەرمی مرۆیان. ڕەپ.

**هێڕتن** (باک.): بهێڕە، هاڕین.

**هێردی** (باک.): دەستاڕ.

**هێرفست:** هێقرست، هێقرز. (باک.) عەرعەر (جوورە دارێکە).

**هێرش:** شالاّو، ئێرش، گەمارۆ، پەهین، دووکووم، هەرشەم، هاتنەسەر، هووروورم، پێدادان، پێداکێشان، پەلامار.

**هێرش بەگەڵ:** ڕەش بگیر.

**هێرش بردن:** لێ ڕابوون. حەمبارۆزی دان، پەلاماردان.

**هێرک** (دەر.): دەستەبەرد، بەردێکە پڕ بەدەستی بێ یا تۆزێ گەورەتر.

**هیر** (خۆ، هەو.): بەخت، هات، برەو.

**هیرگز** (باک.): بەرزی زەوی وەکو گۆی مەمک لەبەر قەدی کێوان.

**هێرماڵ** (سور.): (هەو.) هیربار، قاپ و قاچاخ، ئاسنجاو.

**هیرنگ** (باک.): هێلەگ.

**هێرۆ:** گولێکی هەمەڕەنگە و بێ بۆنی کەوی و کێوانی یە.

**هێرۆنک** (باک.): هێکرۆن، هێلکە و ڕۆن.

**هێرێ** (هەورا.): دوێنێ. (باک.) بێ گوناه، بێ کەم و کوڕی.

**هێڕین:** هاڕین.

**هێز:** لەشکرگا، لەشکرخانە، سوپاگە، سوپاخانە. (دزە، خۆ.) شنگ. (باد.) خوڕ. (باک.) ئەنیا، برە. (شن.) شەنگ. (ڕۆژ.) هاز، گف، نیرەوان. (فە.) هەرەنک. ڤەژەن، گووژم، گوڕ، مەندینە، ستووری، کۆتەکی، گۆ، تووک، دەست و دوو، لو (لەشە)، وزە، هەڤل، زەبر، تەوژم، تەوسم، خورت، تین، تاقەت، پەرویۆ، پەلویۆ، هیل، پرزە، زۆر، گووژان، گاز. بە ــ: بەتین، تیندار، بەگوڕ، بەزەبر، هێزدار، توانا، ڕەوال، دووتا، تۆپز، وەتین، بەگوژم، بۆنگ. بێ ــ: بێ ناو، بێ توانا، ڕاییج، بێ تووک. لە ــ خستن: لەدەست و دووخستن، بێ تین کردن. ــ ی ژوورەوە: ویژدان.

**هێزدار:** بەزەبر، زەبردار، (باک.) خەوەروو، داگرتن، تیندار، بەتین، هازدار، بەهاز، ڤەژەنی. (باک.) بگەودە، بۆک، بۆکە، دووتا، دووتس.

**هێزە، هێجە:** تەگەی مامز و ماسییە. دەڵێن: مامز و ماسی ــ یێتی.

**هێزدان** (فە.): هەڵگرتن.

**هێزم** (هەورا.): دار. (فە.) داری ووشک، داری سووتاندنێ.

**هێزوک** (زێ، باد.): جۆلانە.

**هێز** (باک.): هێشتا. (باک.) هین، هیّ.

**هێژا:** نرخدار، بەنرخ، بەهادار. سازگار، شیاو، لایق.

**هێـژان** (بـاک.): هـەژان، ڕاژان، جـوولان. ـــ دن (بـاک.): هـەژاندن، ڕاژاندن.

**هێژایی:** لێهاتوویی.

**هێژتن:** هێشتنەوە.

**هێژیان** (باک.): هێژان، هەژان، بهێژە.

**هێژیر** (باک.): هەنجیر.

**هێس** (ڕەوا.): واق وڕ، سەرگەردان. ـــ مایە: واق ماوم.

**هیس** (شەم.): خوار، خیس. چتێکە ڕێک نەکەوێ. (ڕۆژ.) مـل کوور، کوور، پشت کوور.

**هیسا** (باک.): بەتاڵ، خاڵی. ـــ کردن: بەتاڵ کردن.

**هیسار** (باک.): چیمەنێکە داری لێ چەقابێ.

**هیساهی** (باک.): ئاسانی.

**هیسانی** (باک.): ئاسان.

**هێستر:** ئێستر. (باک.) فرمێسک. (بـە زاراوەی طـوریّ: فرمێسک).

**هێستک** (سور.): ئێسک.

**هێستی** (شکا.): ئێسک.

**هێسک** (دەر.): ئێسک.

**هێسک گرەوە:** بەیتاڵ.

**هێسن** (باک.): ئاسن.

**هێسن جاو** (باک.): ئاسنجاو، قاپ و قاچاخ.

**هێسن گەر** (باک.): ئاسنگەر. ـــ ی (باک.): ئاسنگەری.

**هێسنی** (باک.): ئاسنی.

**هێسوون** (باک.): بهێسوو، سوونەوە، تیژکردن.

**هێسین** (هەک.): سوونەوە، تیژکردنی تیغ. سوواخ کردنی دیوار و سەربان و ئیتر.

**هێش:** (کۆ.) ئازار. (کورد.) هێڵ. جەغزی درێژ و ڕاستی جووتی یە.

**هێشان** (باک.): گەنین، گەن بوون، خراپ بوون. بهیشـە. ـــ دن (باک.): گەناندن، خراپ کردن.

**هێشە:** دەندە، هەوجاڕ.

**هێشەت** (هەک.): شارۆچکە، شاری چکۆڵە.

**هێشت** (باک.): مێگەلێکی گەورەیە.

**هێشـتا:** (باک.) هێژ، هیّ، هێشـتان، هین، هێمـان، تـا ئێسـتا، هنیـا. (هەورا.) هوما، هەڵای، هەمای.

**هێشتان:** هێشتا.

**هێشتر** (باک.): وشتر.

**هێشترڤان** (باک.): وشترەوان.

**هێشترگا** (باک.): زەرافە، جوورە ئاژاڵێکی بەرزی مـل درێژە.

هێشترگا

**هێشتن:** هێلان، ڕێگادان، ڕێ پێدان. نە ـــ: قەدەخەکردن، بەربەستکردن. بە جێ ـــ: لێگەڕان، واز لێهێنان، مارزۆ.

**هێشتنەوە:** بەجێ هێشتن، وەدوادان، پاشەکەوت کردن.

**هێشک** (دەر.): کێشک، پاس.

**هیشوو:** هۆشە، وەشی. ـــ ی تریّ و ئیتر. ـــ ی چکۆڵـە: (باک.) جیرک، ئەتفک. ـــ ی گوڵـە گەنم و جۆ و ئیتر: ووشک. (باک.) نووشی. (کە.) ئیشوو، هووشی. (ڕۆژ.) پۆل.

**هێشوو:** (باک.) تلۆتیک، گووشی، (خۆ.) وشی.

**هیشووگەر:** گوڵ هەڵگرەوە. (باک.) ئەفارە.

**هێشناتی** (هەکا.): شیناوەردی.

**هێڤشاندن** (باک.): کۆتایی کردن، درێغی کردن.

**هێڤ** (باک.): هەیڤ. مانگی ئاسمانی.

**هێڤار** (یەز.، بـاک.): ئێـوارە، ئیڤارە. ـــ ا وەخۆش (بـاک.): ئێوارەتـان باش.

**هێڤە** (باد.): واوە، بێرەدا. (بۆ نێزیکە).

**هێڤران** (زا.): باراش.

**هێڤرست** (باک.): هێرڤست (دارێکە).

**هێڤشاندن:** کورت کردنەوە.

**هێڤکەرێ** (بار.): تەماشاکە.

**هێڤۆرۆ** (باک.): جوورە تریّ یەکە.

**هێڤی** (یەز.، باد.، بـاک.): تکا، خوایشت، هێرڤست. هەویا، ئومێد، هیوا. بێ هێڤیتی: ناهومێدی.

**هێڤی دار** (باک.): هیوادار، هێڤی کار.

**هێڤی کار** (باک.): هیوادار.

**هێڤین** (باک.): خۆشەویستی.

**هێک:** (خۆ.، هەو.): لەپڕ، نەکاو. لـە ـــ وە: لـە پڕڕا. (باد.، شکا.، بـاک.) هێلکـە. ـــ یّ کـەو (بـاک.): جـوورە تـریّ یەکـە. ـــ کـردن: هێلکەکردن. هیچکام.

**هیکڕا:** لە نەکاو ڕا، لەکت و پڕ.

**هێک ڕۆن** (باک.): هێلکە و ڕۆن.

**هێل** (باک.): هێز. ـــ داین: بەهێزکردن. ژ هیلا خوە کەتن: بیّ تێن بوون. کەنار، وڵات، هەرێم. (هەک.) هێڵ. نە ـــ: نەهێشتن.

**هێـڵ:** (مـوک.) هێـل. (باد.) جغز، خەتی ڕاسـتی جووتی. ڕیـز، ڕێـز. (هەورا.) جغزی ڕاست. وڵات. (شن.) هەنگامە، کارسات. ئەو پیاوە سەر ـــ انە.

**هێلاڤیتن** (باک.): هەڵاوێژتن، هیلاڤیژە.

**هێلان** (باک.): جۆلانە.

**هێلان:** هێشتن. هێلی یەکسانی. بە جیّ هێشتن. (شن.) کارسات، هەنگامە، کێشە. (باک.) بەجیّ هێشتن.

**هێلانـە:** هێلـین، هێلینـک. (هـەورا.) لیـانی. داڵـدەی بـاڵندان، ئـەوای بـاڵندان. سـووڕاندن، چـەرخاندن. ـــ دروست کردن: گووزوو. ـــ تێکچوو: هێلانەوازە، ئەوا تێکچوو.

هێلانە

**هێلانە دۆز:** مریشکێکە لە هێلانەی خۆی بگەڕێ.

**هێلانە دۆزی** (دزە.): گەڕانی مریشکە بۆ هێلانە دۆزینەوە.

**هێلانەوزە** (بابا.): هێلانە تێکچوو، ئەوا تێکچوو.

**هێلانۆک:** جۆلانە.

**هێلە** (باک.): گووتراو، لێدراو، کووتراو. (هەو.) بێجگە، جگەلە.

**هێڵە:** (گەر.) شەڕ، فتنە، دووزمانی. (هەورا.) هێلکە. (ڕۆژ.) بلێسە. (موک.) ئامور.

**هێڵەبڕکێ** (کر.): شێف.

**هێڵە ڕوەنە** (هەورا.): هێلکە و ڕۆن.

**هێڵەساو** (هەورا.): هێڵە: هێلکە. ساو: سوونەوە. بە سپێنەی هێلکەوە سوونەوە. چاوە خانوێکی نێو باغانە، کە سەربانەکەی بەگڵی سوور سوواخ و ئەویش بە بەردێکی لووس، کە (سیرەکوڵی) پێ دەڵێن دەیسوونەوە تا سێ ڕۆژان لەسەر یەک تا هێندە لووس دەبێ ئەوسا هەموو جوورە میوەیێکی لەسەر وشک دەکەنەوە.

**هێڵەک** (گەر.): سیخمە، بەروانکە.

**هێڵەک:** ئێلەگ، هێلەکە، هەلەگ، وەرێژ، (کە.) ئەڵەگ. ـــ کردن: وەرێژکردن.

**هێلەکان** (باک.، سع.): جۆلانە.

**هێلەکە** (هەورا.): هێڵەگ.

**هێڵەوە:** وە درەنگ خەر.

**هێڵەهێڵ** (ڕۆژ.): (فە.) بلێسەبلێس.

**هێلشتن** (باک.): هێشتن.

**هێلک** (باک.): گوون، ئالقەی جۆلانە.

هێلکە

**هێلکە:** هێک، خایە، زەبرەقوونە، هێلە. (باد.) هێک.

**هێلکەدان:** ـــ ی گونی. بەش بۆ خەڵک وەرگرتن.

**هێلکەشینە:** جوورە گەمەیەکە.

**هێلکەو ڕۆن:** (هەورا.) هێڵە و ڕۆەن. (بار.، گەر.) تاوا هێک، هێک ڕۆن.

**هێلکە و شۆربلو:** سپیاو.

**هێلکەیی:** دووسەری.

**هێلم:** بۆ پڕکردنەوەی درزی کەل و پەلی دارتاشی و درزی خەنجەر و ئیدیکە بەکاردەبرێ. (باک.) هەلم. (هەو.) مرازێکی تەونییە.

**هێلمی مەسی:** (باک.) ئەفری.

**هێلنج:** (ڕۆژ.) ئێلنج، قرپ. (بابا.) ئێق. ـــ هاتنەوە: ڕوو لە ڕشانەوەکردن. دڵ پێکاهاتن. ـــ هاتن: غەلین، لەهەڤدان. ـــ هێنانەخۆ: غەلاندن.

هێلیکۆپتەر

**هێلیکۆپتەر:** جوورە فڕۆکەیەکی پەروانەدارە.

**هێلین** (باک.): بروانە: هێلانە.

**هێلینک** (باد.): بروانە: هێلانە.

**هێرۆنک:** هێڵە ڕوەنە.

**هێکا کەلاندی** (باد.): هێلکەی کوڵاو.

**هێکا دلێ** (باد.): هێلکەی دەڵەمە، نیڤ برش.

**هێکەکردن:** هێک کرن.

**هێما** (هەورا.): هێشتا.

**هێمان** (دا.): هێشتا، تائێستا.

**هێمانە** (دەر.): ئێستا.

**هێمە** (دەر.): ئێستا.

**هێمن** (بابا.، کە.، ڕۆژ.): لەسەرەخۆ، گران، سەنگین، بەکاوەخۆ، ئارام، ڕاوەستاو، هێدی، هێواش، گەوشک (بۆپیاو). ئێوی پیاوانە. مەند، سەرخۆ.

**هێمنایی** (خۆ.، ڕەوا.): ئارامی، لەسەر خۆیی، گرانی.

**هێمی** (باک.): تەڕ، نمدار. ـــ تی (باک.): تەڕی، نمداری.

**هێنا:** ئەندێشە، یاد، وەبیرهاتنەوە.

**هێنان:** هانین، ئانین. (هەورا.) ئاردەی، ئاوردەی. (دەر.، فە.) هاوردن. (باک.) ئینان. ئاوردن. ـــ ە خوار: داگرتن. ـــ ە بەربار: خستنە ژێردەست. ـــ ە دەست: وەدەست خستن. ـــ ە پێش: پێشکێش کردن. ـــ ە پێش چاو: بە چاو دادانەوە، ڕامان. بهێنە: باوەرە، بێنە، بیرە، بیرانە. ـــ مەبەر: هێنانە بەردەست.

**هێنانە خوار:** ئانینە خوار، میچکاندن.

**هێنانەدی:** وەدی هێنان، ئانینەجێ. وێک هێنانەوە: ئانینە هەڤ. بە ـــ: بەرگرتنی دارانی بەری.

**هێنانەوە:** ئانینڤە.

**هێناندن:** هێنان، ئیناندن.

**هێند:** هێندە، هەند، چەند، نەخت، بەش. (باک.) ئەڤچەند، قاس. هێندێک: کەم، چک، بڕ، تۆز، نەختێک، بەشێک. ڕێز. بە ـــ گرتن: پێز پێداهاتن، ڕێزگرتن. بە ـــ نەگرتن: ڕووگرتن.

**هێندە:** ئەوەندە، هندە، بەقەد، چەند، بەرتەقا، بارتەقا، چقاس. (باک.) ئەو چەند، ئەڤهێندە. من ـــ ی پێم گوت: من چقاس ژێرەگۆت.

**هێندەک:** هێندێک.

**هێندەی:** ئەوهەندە، ئەوەندەی، هەفقاس.

**هێندێ:** برێک.

**هێندێک:** هێندەک، هەڵێ. (باک.) هینەک، هن، هنکا، هنک.

**هێژین** (باک.): بهیژە، باوێشک.

**هێنک** (باک.): فێنک. ـــ اهی (باک.): فێنکێتی.

**هێنکەبڕ** (هەو.): زۆر ماندووبوون و تەنگە نەفەسی لە ماندێتی دا.

**هێوارە:** ئێوارە.

**هێواش:** حاستەم. (کە.) ئێواش، یەواش، هێدی. بە ـــ ی: بەماتەماتی.

**هێوان** (باک.): ڕزگاری، خۆشحاڵی، بەختیاری، خۆش، هەیوان.

**هێوە:** ئێوە، ئەنگۆ.

**هێوەر:** تێ، بلێ. (هەو.) شووبرا. برای مێردی ژنی یە.

**هێوەرە:** (خۆ.) شێنەیی، هێدێتی، ئارامی و ئاسوودەیی دوای توڕەیی و ماندوێتی. پالاخی سێ ساڵانەیە. (شەم.، باک.) ئێوەرە.

**هیوەرەزا:** کوڕی برای مێردی یە.

**هێوەرژن:** (هەو.) هەوگیان. ژن بۆ ژنی ژنی هێوەری دەبێتە ـــ. ژنی هیوەران دەبنە ـــ ی یەکتری.

**هێور** (باک.): لەسەرخۆ، ئارام بوونەوە دوای توڕەبوون یا ماندووبوون.

**هێوران** (ڕەوا.): هێدی، هێواش، لەسەرەخۆ.

**هێوراندن** (باک.): دامەزراندن، کۆکردنەوە، جێ نشین بوون.

**هێورین** (باک.): دامەزران، کۆبوونەوە، بەهێورە.

**هێوڵ** (هەو.، دزە.): هێدی، ئارام.

**هێوڵی** (هەو.، دزە.): لە ڕق و هەڵچوون ساردبوونەوە.

**هێوین:** هەرێن.

**هێوی** (باک.): هەویا، تەڕی. نێوی ئافرەتانە.

**هێ هێ** (دزە.، هەر.): بزنە گەلی پێ بانگ دەکرێ.

**هێ یەه** (ڕۆژ.): بۆ گلدانەوەی بزن و ئیتر.

**هێ ێ:** ئەرێ، هۆی.

**هی:** خوو، هیم، ئی. (باد.) فێر. ـــ کردن: فێرکردن. ـــ بوون: فێربوون.

**هێن:** ئی، هن. (باک.) ئارزی. لەمەڕ. (دەر.) هین. ـــ من: ئی من.

**هیت** (هەورا.): جووت، هیتە. ـــ کردن: جووت کردن. (باک.) قاپ، ئامان، لووس، ڕەمەکی، بێ نیشانە و لەکە.

**هیچ:** (باک.) چوو، توو. هەچی، تخ. (ڕەوا.) ئەشتەبا. هیچ یەک، هیچ کام، ئاس و پەلاس. توو، پیچ. بە ـــ ی: بە خۆڕایی.

**هیچاک:** خووی چاک، هێمن، هیم چاک.

**هیچتا:** هێشتا.

**هیچ چنێک:** (ڕەوا.): ئەشتەبا، هیچ کام، ئێک، هیچیان.

**هیچ کامیان:** نیک، هیچ یەک. هیچیان.

**هیچکەس:** توو کەس.

**هیچکۆچی** (هەورا.): مێوژ.

**هیچ و پووت:** پەرچی، هەرچی و پەرچی.

**هیچ و پووچ:** سەرسەری، خوێڕی، پەست، بێ سەروین، زیف، نەزان، کەسەرباد، گێل، توڕەهات. ـــ ی: نزمی، کەم، پەستی، ناتورەیی، پرووپووچ، ناتۆرە.

**هیچهار** (باک.): بیباری سوور.

**هیدمان:** سەرسوڕمان، واق وڕمان.

**هیر** (هەو.): زانا، ژیر، خانەدان، بەخت، هات. (باد.) فێر. ـــ بوون: فێربوون. بێ ـــ ی: بێچارەیی. بەخت ڕەش.

**هیرا** (باک.): ـــ بوون: هین بوون.

**هیربار** (هەو.): بە هەمموو قاپ و مسان دەڵێن. (سور.) هیرماڵ، دەفر، ئاسنجاو.

**هیربزان:** چینی سێ یەمی میرەکانی ساسانیان بوون و دادوەری وڵات بوون. دادوەر.

**هیرتە** (هەو.، باڵک.): قایشێکە بۆسە و هیرتەی لێک دەبەستێ. (کە.) ویژە. (ڕۆژ.) نویژە، نیرتە، ویژە.

**هیردار:** ژیر، هۆشمەند.

**هیرێ:** دوێنێ.

**هیرک** (ڕۆژ.): دەستەبەرد. (دزە.) گاشە.

**هیرگا:** کۆلیژ، خوێندنی باڵا.

**هیرۆ** (باک.): هێرۆ.

**هیرین** (باک.): حیلاندن، حیلەی ولاخی یە.

**هیزا** (باک.): چارشێو. جوورە سەرپۆشێکی ڕەنگا و ڕەنگی ژنانە سوور یا زەرد یاشینە.

**هیزار** (هەو.): پۆشین. جوورە پارچەیەکی ڕەشی ئاوریشمی ژنانەیە لەسەری دەکەن. (باک.) مشار.

**هیزارچی** (باک.): دارتاش.

**هیزە:** پێستی مەڕ دوای چاک کردنی، بۆ هەڵگرتنی ڕۆن لە ناویدا. ـــ ی ڕۆن و دۆشاوی. (باک.) هیز، خیگە. (هەو.) دەخیل، ئامان.

**هیزەک** (باک.): دابەش کردن بەسەر چەند لکێک دا، لکە جۆگەی ئاوی.

**هیزرە:** ئەنباری دەخڵی.

**هیزکەردە** (زەن.): هەڵستان.

**هیس** (هەو.): قورمی دیوار و میچانە، کە لە تۆزو دووکەڵی پەیدا دەبی. دوودەی چرا، سناج.

**هیستۆک** (جز.، بۆتا.): ژێردەست.

**هیش** (باک.): قەراخ دەریا.

**هیشک:** وشک، ئیشک.

**هیشک ئاوز:** هیشکاوز، (دەر.) وشکەوەرد.

**هیشکۆلک** (باد.): تووی ووشک.

**هیفارتن** (باک.): چنین، گۆرەوی چنین.

**هیڤە:** هەویا، ئومێد، هیوا، (یەز.) هێڤی.

**هیڤەکێش:** ئومێدەوار، هەویادار.

**هیڤی** (باک.): هێڤی.

**هیلم** (باک.): هەڵم، دراوسێتی، دەراوسێ یەتی.

**هیلین** (باد.): هێلانە.

**هیم** (جا.): خوو، ڕەوشت، ڕەفتار. پایە، تەختە، بەرد، تات.

**هیما** (هەورا.): هێشتا.

**هیمان** (فە.): هێشتا.

**هیمدا** (باک.): دامەزراو، بنکە.

**هیمی** (باک.): خراپ و گەنەبون، بێکارە.

**هین:** ـــ کردن: فێرکردن. ـــ بوون: وشیاربوون. هەرامە. ـــ ی منە: هی منە، ماڵی منە. (دەر.) ئی و انێک، جایێ. کابرا، (باک.) هێشتا.

**هینا** (باک.): هین، فێربوون.

**هینان:** هێنان.

**هینەر:** فێرکار، مامۆستا.

**هینەک**: هێندێک، چەندێک.

**هینەهین**: هانەهان، هانکەهانک.

**هیندوویی** (بابا.): جوورە ترێ یەکە.

**هینک**: فێنک.

**هینگ** (شکا.): هەنگی ولاخان.

**هینگ و دەنگ** (باک.): شکۆ، پایەبەرز.

**هینی** (باد.): هەێتی.

**هینی مینی**: تیرەیەکە لە (لور.) شێوەی ئاخۆتنیان زۆرسەختە.

**هیوا**: ئومێد، ئامانج، پوونگال، هەویا، ئارەزوو، تکا، هێڤی.

**هیوادار**: مەهدەرڤان.

**هیوابڕ**: ناهومێد، بێ هەویا.

**هیوابڕاو**: هەناسە سارد، پشت سارد.

**هیوی** (شکا.): هێڤی، تکا.

**هیوێن**: بڕوانە: هەوێن.

# ی

**ی**: دوا تیپی ئەلفبێی کوردییە. ئەو، وی (بۆ یەکێکی نەدیوە بە دوای وشانیشەوە دەنووسێ و دەشکەویتە نێوەڕاستی وشانیشەوە): دەنووسێ، بیدەیە. بۆ دانە پاڵ و خستنە سەر: کتێبی من. لە موکریانێ بۆ بەندیواری بەدوای وشانەوە دەنووسێ وەکو: ئەو پیاوەی، ئەو کارەی. جێناوی نادیار وەکو: بابی. خواردی. بۆ هەندێ سەرچاوە بەکاردێ وەک: دۆستی، برادەری. بۆ ـــ وەکو: سابلاخی، بارزانی ـــ وەکو: هەوای بەهار. کوردی کوردستان. داماوی موکریانی. ـــ ی نادیار بۆ یەک کەس یا یەک چت: پیاوێ، تاوێ.

**یا**: لە شوێنی کورت کردنەوە: یاگە، یان، ئان، یاخۆ. (ئاک.، ئامێ.) ها، ئاها (بۆ واقمانە). (بار.) دبینێ بەسێ: ئەوی پێ ی دەڵێن بەسێ. یان، ئان. (خۆ.، باک.) مرازی خاوەندێتی و تایبەتێتی: ـــ من: هی من.

**یێ**: پەسوەندی وشەی: کچێ، دایکێ، خۆشکێ، دێدێ، پووڕێ و هتد. تەنها بۆ مێ ینانە و نیشانەی مێ ینانە. زۆرتر لەکاتی بانگ کردندا بەکار دەبرێ وەکو کچێ: هۆی کچ. دێدێ: هۆی دێدە. لە شێوەی هەورامی دا بۆ گەلە وەکو: گۆشواریێ: گوارەکان. وەرێ: بەرخەکان. بزنێ: بزنەکان.

**یابوو** (کە.، ڕۆژ.، فە.): بارگین.

**یاتوو** (ئاوێ.): جادوو.

**یاخۆ**: یا.

**یاخێتی**: هەڵگەڕانەوە، زیت بوونەوە، قاچاخی.

**یاخە** (فە.): یەخە، یەقە، بەرۆک، ئێخە.

**یاخی**: پەت پساندن، بارنەبردن، ئازادی خوازتن، سەرکێشی، بەمزاج، لامۆخەک، ختمی، هەج، دانەساخ. قاچاخ: کەڵەمەشکێن: گوونەرەش: گوونک.

**یاد**: (فە.) هوور. (باک.) بیراهی. (باد.) هزر. (هەورا.) ویر. ئاسە، چێل، بیر، بەر، هویر. ـــ کردن: چێل کردن. کردنەیاد: لەبەرکردن. وەیاد هێنانەوە: وەبیر هێنانەوە. لە ـــ دابوون: (باک.) پیرۆ میژوولی.

**یادگار**: (باک.) بیرهاتی، سەربۆری.

**یادێ** (بۆتا.): دایک، (لەکاتی بانگ کردنێدا).

**یار**: دۆست، دڵدار، یۆو.

**یارا**: توانایی، لێهاتوویی.

**یارای** (هەورا.): وێران، توانین، توانایی. نە ـــ: نەتوانین، نەوێران.

**یارەڵەمسی**: پەتاتە، کرتۆپە، رتاخ، کارتۆل، سێڤەزەمینی، خرکە گازۆڵە.

**یارەما** (ئەردە.): برکەی هاروێ و ترێزوو.

**یارمەتی**: یاریکاری، ئاری، یاری، هاوپشتی، کۆمەگی، خەرمانلۆخە. ـــ دان: ئاوڕ لێ دانەوە. هاوپشتی دان. ـــ کردن: زج کردن. چاوەدێری، یاریدە، یاریە.

**یاردووم**: یاریدە.

**یارۆ**: گۆرین، هێما بۆکراو، باس کراو، ناوبراو.

**یاری**: یارمەتی، گەمە، گاڵتە. ـــ کردن: (باد.) یاری کرن، لێزین.

**یاریدە**: یارمەتی، یاریکاری، هاری، هاریکاری، دەستیار، یاردوم، یاریە. (هەو.) زبارە، گەل کردن. (دەر.) هامەیاری، یاری. ـــ دان: خۆدانە بەربار، ئاوڕ لێدانەوە، هاوڕ لێدانەوە، سەراسوێ کردن.

**یاریدەدان**: یاربوو، یارمەتی یەکتری دان.

**یاریدەدەر**: یارمەتی دەر، یاریکار، یاریکەر، (باک.) ئاریکار.

**یاریکار**: یاریدەدەر، یارمەتیدەر، (باک.) ئاریکار. (هەو.) زبارە، گەل. (باک.) یارمەتیدان، گەمەکەر. ـــ ی: ئاریکاری، هەرەوەز، یارمەتی، زبارە، گەل کردن، هاریکاری.

**یاریگە**: گۆرەپانی یاری کردن، شوێنی یاری کردن.

**یاس**: جێگای زۆر سەخت و تووش لەکێواندا. یاسەمین.

**یاسا**: یاسە، ڕێ و شوێنی و ڕەفتاری باب و باپیران، خوو، داب و نەرێت، بنەما، ڕێک خستن، بنەڕەت. ـــ کۆ: تۆمارکردنی یاسا. ـــ ی بنەڕەتی: ڕێ و شوێنی بنەما.

**یاساخ**: قەدەغە، یەساخ، قۆرخ. ـــ کردن: قەدەغەکردن.

**یاساوڵ** (کە.، جا.، کۆ.): کێشکچی، ئێشکچی، پاسەوان.

**یاسەمەن**: یاسەمین، (باک.) ئەسمین، مەران، ئاسمین. دارێکە بە گوڵەکەشی دەڵێن ـــ. نێوی ئافرەتانە.

**یاسەمین**: یاسەمەنە.

**یاسەی سەخت**: بەردی سەخت و بڵند. بەردی ڕەق. گاشەبەرد.

**یاشتن** (کەل.، فە.): ژیان.

**یافا**: قسەی ناراست.

**یافت**: نیشان، شوێنەوار.

**یاقما**: تالان.

**یاقووت**: (باک.) یاگەنە، ئاقووت، یاخەنە. (بابا.) ــ ی: جوورە ترێ یەکە. وەکو رەنگی یاقووت.

**یاقووتی زەرد**: (باک.) بەر زەرین.

**یاک**: داک، دایک.

**یاکردن**: بەقسەکردن.

**یاکۆ** (باک.): یاخۆ، یا، ئەو شتەی.

**یاگە** (هەورا.): جێگا، جێگە.

**یاگی** (باڵە.): ئاور، ئاگر.

یاگی

**یاڵ**: (رۆژ.): بڕ، بڕی، دەهەف، ژە، ژیی، یال و بڕ. (جا.) گرد و تەپۆلکەیە. (رۆژ.) رێگا و بەرزایی سەرشاخ و کێوانە. تووکە درێژەکەی سەرملی ولاخی بەرزەیە.

**یاڵ و بژ**: یاڵ. مووی سەرملی ئەسپ و شێر. مووی سەری ئالۆزاو.

**یام** (هەورا.): یا، یان، ئان.

**یامە** (ئاوێ.): جام، شووشە. (ی یەکە بۆتە ج).

**یان**: یا، یاخۆ. (بابا.) دان، پێدان. (لە ئەدیوی دوان). خانوو، ماڵ.

**یانە** (شبە.، زا.): هۆرگە، خانوو، ماڵ.

**یانزدە**: یازدە.

**یانزدەم**: یازدەهەم.

**یانزدەمین**: یازدەهەمین.

**یانگزە**: یازدە.

**یانگو** (باک.): یا، یانی، واتا.

**یانی**: ئانکوو، ئانگۆ. ئەکاو، لەپڕ.

**یانی گر**: (زا.) نیمیگیر. نهێنی گیر، دیان گیر، لاگیر، نیان گیر، نهێنبڕ، نهان گیر، پاشدڕ، پاشگر. سەگێکە لە ئەکاو و لەپڕا خەلکی بگرێ.

**یاو** (هەورا.): تا، نۆبەتی. (باڵە.) ئاو. گەیشتن. بیرەوەری.

**یاوا** (هەورا.): گەیشت.

**یاوان**: بیابان، چۆل. گەیشتن.

**یاوای** (هەورا.): گەیشتن، هاتن. بۆ میوەش دەبێ.

**یاوەر** (هەورا.): هاواڵ منداڵ، پایەیەکی پێشمەرگەیەتی یە. ئێوی پیاوانە.

**یاولەرز** (هەورا.): تاولەرز.

**یاونای** (هەورا.): گەیاندن.

**یاو و تاو**: گەرمی تا.

**یای**: (هەورا.) بانوو. خات، خانم. لە پێش میدیەکاندا کورد بۆ رێزی ژنان بەکاریان دەبرد. ئێستاش لە نێو هۆزی مەنگوڕ و گەورکاندا بەو چەشنی بەکاردەبرێ. (کۆ.) دیدە (بۆ خوشکی گەورە بەکاردەبرێ).

**یایانە**: بانووانە، خاتانە، خانمانە.

**یایە**: دایک.

**یایک**: پوور. دایک.

**یایکزا**: پوورزای دایک.

**یایێ**: ئێوی ئافرەتانە.

**یە** (فە.، هەورا.، کەل.): ئەوە. (موک.) وە. (دەر.) ئەست، گەورەیە، گەورەست. وە.

**یەخ** (هەورا.، فە.): سەهۆڵ.

**یەخە** (کە.): ئێخە، بەرۆ.

**یەخە دادڕای** (هەو.): جوورە گەفێکە لە سێ جوورەکانی قەندەهاری.

**یەخ بەندان** (هەورا.): یەخ بەنان. (زەن.) ماسیان، سەهۆڵ بەندان.

**یەختە**: (باک.) ولاخێکە خەسابی، ئێختە.

**یەخترمە** (باک.): تالان.

**یەخدان**: ئێغدان.

**یەخسیر**: ئێخسیر.

**یەخنی** (رەوا.، هەورا.): خۆرشت.

**یەدەگ** (کە.): دەژ، نوستوو، پێش بین، دووربین، تێ بینی. (باک.) ئەردەک، ئیردەک. منیەک.

**یەر** (تی.): زین.

**یەرەق** (هەورا.): دەندە، هەوجاڕ. (فە.) چەک.

**یەرێ** (هەورا.): سێ، یەری.

**یەز** (ئاوێ.): رێز، پەرستن.

**یەزەتە** (ئاوێ.): پەرستراو، خوا.

**یەزدان**: خودا، خولا. (لە ئێزدەوەیە).

**یەزیدی**: داسنی.

**یەسلخ** (باک.): یاساخ.

**یەسە** (کەل.): ئەوەتا، ئەمە، ئە ئەوەتانێ.

**یەشە** (هەو.): بۆ ئاژۆتنی بزن و گوێدرێژە بەکاردەبرێ.

**یەشەهێ** (دزە.): بزنە گەلی پێ دەگەڕێتەوە.

**یەشەیەش**: بۆ ڕاگرتن و ئاژۆتنی بزنان بەکار دەبرێ.

**یەشم** (هەورا.): بەردێکی ئەرمە پیاڵە و چتی دیکەی لێ دروست دەکرێ.

**یەغە**: زیندەوارێکە لە نێوانی سەگ و پشیلەی دا، چوارپەلی کورتن و رەنگیشی بۆرە.

**یەغنی کێش**: جوورە قابێکە.

**یەقە** (ئاوێ.): جۆ، (ی بۆتە ج).

**یەقەنیتات** (ئاوێ.): جاوید. (ی بۆتە ج).

**یەقەن** (ئاوێ.): جووان. (ی بۆتە ج).

**یەقە** (کە.): ئێخە.

**یەک**: یێک، ئێک، یەی. (هەورا.) یۆ. (۱) ــ تەبا، جووت، ڕێک، ئارام، ئاشت. ــ گرتن: هەڤدان. یەکایەک: (باد.) یەکیەکە. لەگەلێک جێگایاندا مانای پێکەوە دەدا. ئەڤ یەک. ئەئەوە، هۆوە. ژبەر ڤێ یەکێ لەبەر ئەوەی. بە ــ ەکەوە: پێکەوە، تێکرا.

**یەک ئاھەنگ** (باک.): یەک دەنگ.

**یەکاڵە** (بابا.): یەتاڵووکە، قەڵشتن. دوو پارچە و شەق کردن.

**یەکانە**: تاکانە، بەرازی نێرەیە. برە، تاقانە. (زمن.) یەکتا.

**یەکانی** (باک.): یەکتایی، یەگاتەی.

**یەکاو**: ئەو حاستەیە، کە دوو جۆگە یا چۆم یا زێ ی تێدا وێک دەکەوێتەوە.

**یەکاوە** (هەورا.): قوبوڵی، جوورە پلاوێکە. دەم پوخت.

**یەکاویەک**: لە هەوەڵجاردا بە سوودە. یەکەیەکە. بۆ یەکەم جار. هەر ئەودەم، پڕ بە پێست.

**یەکەدار**: پیاوێکە تەنها وڵاخێکی هەبێ و چەند وڵاخێکی دی لە یەکێکی دیکە وەرگری و بەتێکەڵاوی کاسبیان پێوەبکا، بەرێ چوونی خۆی و وڵاخەکەی لەسەر خاوەند وڵاخەکانە و قازانجی وڵاخەکەی خۆشی بۆ خۆیەتی.

**یەکەر** (باک.): نێوان، ماودا، ماوە.

**یەکەڵگوون**: قۆرێکە تەنها گونێکی هەبێ.

**یەکەندەر دوو**: لەناکاو، لەپڕا.

**یەکەیەکە**: تاک تاکە، تاق تاقە، تاق و لۆق، کەتکەتە.

**یەکباد**: یەکتەن، تەنک.

**یەکباڵ**: یەکتەن، یەکباد.

**یەکبان یەک**: کۆبووەوە، وەسەر یەکدابوون.

**یەکبەرخ**: مەڕێکە یەک جار زابێ.

**یەکبەند**: نەوەند. گوێلکی یەک ساڵانەیە.

**یەکبڕ**: جوانوێکە ساڵێکی تەواوبێ تەمەنی و پێی نابێتە ساڵی دووەمییەوە.

**یەکبینە**: بێ برانەوە، بێ وچان، هەمیشە.

**یەکتا** (ژا.): خودا، خوا، خولاَ. یەکانە، تاق و تەنیا. تاک. بێ هاوپا، بێ هەڤبەر، بێ هەمبەر، بێ هاوشان، بێ هاوتا.

**یەکتەن**: یەکباڵ، تاق و تەنیا و بێکەس. بەتەنهایی، بەتاقی تەنێ، بێ یاریدەدەر. یەکباد.

**یەکتر**: هەردوو، هەڤ. ـــ دواندن: گفت وگۆکردن.

**یەکجار**: ئێجگار، تەواو.

**یەکجۆر**: وەک یەک. هاوبەشی لە ڕەفتار یا ڕەنگ و قەبارە و تام و بۆن و ئیتر.

**یەکچاڤ**: یەکچاو، یەکلەچاو.

**یەکچەلی**: ئێجگاری.

**یەکخستن**: یەک گرتن.

**یەکدان**: دانەیەک، بەیەکتردان، نیو ڕۆژ.

**یەکدەست**: یەکگرتوو، یەکدڵ. (باک.) چۆنە.

**یەکدەستی**: یەکێتی.

**یەکدەنگ**: یەک ڕا، یەک بیر، یەک ئاهەنگ.

**یەکدڵ**: یەکدەست.

**یەکدی**: یەکتری.

**یەکڕەنگ**: سادە، یەک ڕوو. ـــ ی: سادەیی، یەکڕوویی.

**یەک ڕوو**: ڕاست، ڕاستگۆ.

**یەک زوان** (کە.): یەک زمان.

**یەکسا**: یەکڕەنگ.

**یەکسان**: وەکوو یەک، بەرامبەر یەک، یەک ئاست، یەک پلە.

**یەکسەر**: بەخێرا، بێ چەند و چوون، بێ بیرکردنەوە. بێ ڕاوەستان، یەک شەق.

**یەکسەرە**: خۆکرد، بێ پرس، مەیانەیی، ڕاستەوخۆ.

**یەکسم**: وڵاخی بەرزە و گوێدرێژ.

**یەکشەمە**: یەک شەمۆ، کیراکی.

**یەکشەق**: یەکسەر.

**یەکشەمب** (باک.): یەک شەمە.

**یەک شەمە**: یەک شەوە.

**یەک شەوە**: مانگی یەک شەوە.

**یەک شێوە**: یەک وێنە، یەک جۆر.

**یەک کەوتن**: یەک گرتن.

**یەک کەوتوو**: یەک گرتوو، ڕێکەوتوو، پێڕەو.

**یەک گرتن**: هەڤدان، هاودڵ بوون، یەک کەوتن، هەڤدل.

**یەک گرتوو**: یەکدەست، هەڤاڵ بەند، بێ هەمبەر.

**یەکلا**: وەراست گیراو. پیاوەتی ڕاست و دروست. ـــ کردنەوە: (فە.) یێلاکردنەوە.

**یەکلابوون**: دڵنیابوون.

**یەکما** (خۆ.): بەلا قۆقزە بەرینەکەی جگی دەڵێن.

**یەکمان** (باک.): سەرۆک، پێشەوا، گەورە.

**یەک لەسەریەک**: لەسەریەک کەوتن و کۆبوونەوە.

**یەک و دوو**: تاق و جووت، تاق تاقە، تاک تاکە.

**یەکیەکە**: تاک تاکە.

**یەکێتی**: یەکیەتی، یەکەتی، فەرکبوون. هاودڵی، هەڤدلی، بێ هەڤبەری، هەڤداتی. یەک کەوتن، یەک گرتن، هەڤاڵبەندی، پرس دان هەڤ. (باک.) ئێکێتی، پێڕەوی.

**یەکێک**: یەک کەس، تاکەکەس.

**یەکینی** (کۆ.): (باک.) یەکێتی. (موک.) زەقاڵێن. جوورە گەمەیەکە.

**یەلەک**: ئێلەگ، یەلەگ، سوخمەی ئافرەتانە.

**یەڵدا**: یەکەمین شەوی زستانە، کە درێژترین شەوی ساڵە.

**یەڵغار**: هێرش بردنی سوارانە.

**یەلوم**: چۆڵەچرا.

**یەم**: دێم، تێم.

**یەمە** (فە.): ئێستە، هەنوکە، هەنکە، نهۆ.

**یەمن**: هێندە. سەروچاوە، هانە. دێن.

**یەنە**: ئینی، هەینی، جوعمە، جومعە.

**یەندە**: ئەوەندە، هێندە.

**یەنگۆ کەردەی** (هەورا.): لاسایی کردنەوە.

**یەنگێ** (هەورا.): لاسایی.

**یەنو**: ئەمان، ئەمانە.

**یەو** (هەورا.، کۆ.، زەن.): جۆ.

**یەواش**: هێواش.

**یەوە** (هەورا.): یەک.

**یەونان**: وولاّتی یۆنان.

**یەونانی**: جوورە تفەنگێکە.

**یەوی، یەوەی** (هەورا.): جۆ.

**یەهـ**: هۆ. بۆ ڕاگرتنی ولاّخانی بەرزە بەکار دەبرێ.

**یەهەر** (هەورا.): جەرگ.

**یەی** (کەل.): یەک.

**یۆ**: یەک، ئەو.

**یۆتەر** (هەورا.): یەکێکی تر.

**یۆخلەمە**: لەدوورگەڕان.

**یۆر** (هەورا.): کۆن، دۆست.

**یورت**: جێگەی لەوەڕاندن.

**یوژنە**: قایشی جووت.

**یوم**: ودم، بیرۆزی، مومبارەکی، پیرۆزی.

**یۆم**: ئۆغر، ودم، پیرۆزی.

**یۆمە**: رۆژانە. کرێی رۆژانە.

**یۆنە** (هەورا.) کۆن: من، منم.

**یێ** (باک.): ئێ. (شکا.، باد.، نەهـ.) مرازی خستنەسەرە بۆ نێر: برێ من، بابێ من. بەلاّم تەنها لەم چەند وتانەدا بۆ مێ یانە: جانێ، عەزیزێ. لەبانگ کردندا بەکاردەبرێ.

**یە**: ئەمە، ئێک.

**یی**: هی، لەیی: لەهی. ـــ منە: ماڵی منە.

**یێت** (شکا.، باد.، نەهـ.): ئان، بۆگەلە. مریشکێت سپی: مریشکە سپیەکان. پەزێت من.

**ییخ**: بۆ ئیخدانی وشتران بەکاردێ. نیشاندنی وشتر چەند جاران دوپاتی دەکەنەوە. بۆ ئاژۆتنی مەڕ و بزنان. ـــ خواردن: ییخ بوون، هاتنە سەرچۆکان.

**ییخە**: (کە.) حێلە، حێن. ئێخە، جج، چتت، چتتە، ییخەییخە، بۆ لێخوڕین و بۆ دەرکردنی بزنان و کاریلان بەکاردەبرێ.

**ییخدان**: ئیخدانی وشتر.

**یێک**: یەک.

**یێلاکردنەوە** (فە.): یەکلاکردنەوە.

**یێن** (باک.): بۆگەلە. مێرێنەمەزن: پیاوانی گەورە.

**یێش**: ئێش. ـــ ان: ئێشان. ـــ اندن: ئێشاندن.

**یێکەڵ** (موک.): ئاژاڵێکە گوانێکی وشک بووبی. کەرگوران، یێکەلەگوان.

**یێکەڵە گوان** (هەورا.): یێکەڵ.

**ین**: نیشانەی چاوگە وەک: دابەزین، پێکەنین، فڕین.

**یێن** (باک.): مرازی خستنە سەری کۆیە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا: ژنێن گوند: ژنانی گوند. دێن، تێن.

**یینە**: ئەوان، وان.

**یێنی**: یینی.